# معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان
# کەسایەتی و سەردەمی

نووسینی
دکتۆر علی محمد الصلابي



وەرگێڕانی
ئەبوبەکر ڕەسول محمد لۆتەری


منتدى اقرأ الثقافي www.iqra.ahlamontada.com

دار المعرفة
بەیروت

| | |
|---|---|
| نـــاوی کتێـــب | معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ﵁-کەسایەتی‌و سەردەمی |
| نووســـینی | عَلي محمد محمد الصَّلاَّبي |
| وەرگێڕانـــی | ابوبكر رسول محمد لۆتەری |
| نەخـشەسازی نـاوەوە | (محمد علی) |
| نـۆرەو ســاڵی چـاپ | یەکەم ٢٠١٣ |
| ژمـــارەی ســـپاردن | (١٣٩٨)ی ساڵی (٢٠١٢)ی پێدراوە |

# معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان رضي الله عنه
# کەسایەتی و سەردەمی

نووسینی

## دکتۆر علی محمد الصّلابي

وەرگێڕانی

## ئەبوبەکر ڕەسول محمد لۆتەری

**پێشکەش بێت بە :**

ئەوانەی داکۆکی لەسەر باڵادەستی دینی خودای بەرزو مەزن دەکەن، لە خودای دۆست دەپاڕێمەوە بە ناوە جوانەکانیو سیفەتە بەرزەکانی تایبەتی بکات بە ڕووی پیرۆزی خۆیەوە.

خوای بەرزو مەزن دەفەرمووێت:

﴿فَمَن كَانَ يَرْجُوا لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا﴾ **الكهف (١١٠).**

**تێبینی:**

ئەم کتێبە بەشێکە لە کتێبی ((الدولة الأموية عوامل الازدهار وتداعيات الانهيار))، لەبەر بایو گشتگیربوونی بابەتەکە وسوودی زۆری بڕیارمدا سەربەخۆ بڵاوی بکەمەوە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# پێشەكی وەرگێڕ :

سوپاس بۆ خوای گەورەو میهرەبان كە ئەوەندەی زەین و زانیاری و وزە و خۆڕاگری پێ بەخشیم تا بتوانم كتێبی (معاوية بن أبي سفيان - شخصيته وعصره) دانراوی (عَلي محمد محمد الصَّلاَّبي) لە زمانی (عەرەبی)یەوە بۆ سەر زمانی (كوردی) وەربگێرم بە ناوی {معاویەی كوڕی ئەبو سوفیان-كەسایەتی و سەردەمی} ، هیوادارم شیاوی ڕەزامەندی خودا گەورەو پەسندی خوێنەرانی ئازیز بێو بۆم ببێ بە خێری نەبڕاوە و توێشووی دواڕۆژ.

پێشكەشبێ بەگەلی كوردی موسڵمان، ئاواتەخوازم ئەم دیاریەم لێ قبولْ بكات و كەلێنێك لە كتێبخانەكەی پڕ بكاتەوە .

سوپاس بۆ:

١- مامۆستا فائق نارینی خاوەنی دەزگای چاپو بڵاوكردنەوەی نارین كە ئەركی لەچاپدان و بڵاوكردنەوەی ئەم بەرهەمەی خستە سەر شانی خۆی.

٢- مامۆستا ئیسماعیل تەها كە هاندەرم بوو بۆ دەركردنی بەرهەمێكی لەم جۆرە.

٣- مامۆستا مەلامحمودی گەلاڵەیی كە ئافەرینەكەی جەنابیان لە بەرانبەر بەرهەمەكانی پێشترمدا هانیدام ئەم بەرهەمەش دەربكەم.

٤- كاك ئیبراهیم ئاڵی بەردەشانی كە بەر لە چاپدان ، كتێبەكەی خوێندەوەو بە كۆڵێك وشەی ڕەسەن و پڕشنگداری كوردی ئەم كتێبەی زەنگینتر كرد.

٥- مامۆستا محمد عەلی كە لە تایپكردن ودیزاینی ئەم كتێبەدا هونەری لێبڕاوانەی خۆی سەلماند.

لە كۆتاییدا ئومێدەوارم ئەم كتێبەم زۆر بە ئەمانەتەوە وەرگێڕابێت و مافی خۆیم پێ دابێت و سرنجی خوێنەران بە لای خۆیدا ڕابكێشێت و زۆر بە چاكی بیخوێننەوەو لە تێبینی و ڕەخنەكانی خۆیان ئاگادارمان بكەنەوە تا لە چاپەكانی تردا بە سوپاسەوە سوودیان لێ وەربگرین.

ابوبكر رسول محمد لۆتەری

١٤٣٤/٠١/٢٥ كۆچی ٢٠١٢/١٢/٠٨ زاینی

# پێشەکی

ان الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله. ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾﴾[1].

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾﴾[2].

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾﴾[3].

پەروەردگارا! سوپاسێك بۆ تۆ کە لە ڕووی بەرزو پیرۆزت و دەسەڵاتی مەزنت بوەشێتەوە، هەر سوپاست دەکەم تا ڕازی دەبی، ئەگەر ڕازیش بووی هەر سوپاست دەکەم.

پاشان:

**ئەم کتێبە**: بەشێکە لە کتێبی ((الدولة الأموية عوامل الازدهار وتداعيات الانهيار))، ناوم نا: (معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان: کەسایەتی و سەردەمی)، باس لە ڕەگ و ڕیشە مێژووییەکانی بنەماڵەی (ئومەوی) و گەواهیدانی مێژوو لە نێوان (هاشمی)یەکان و (ئومەوی)یەکان و هەڵوێستی (بەنی ئومەیە) لە بەرانبەر (بانگەوازی ئیسلامی) دەکات، هەروەها سەبارەت بەو ئومەویانەی لە سەرەتای سەرهەڵدانی بانگەوازی ئیسلامیدا موسڵمان بوون و، ژن وژنخوازی نێوان هاشمی و ئومەویەکان و، کەسایەتی (معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان) و سەرودەمی ئەو دەدوێت، ئەمجا باس لە ناوو ڕەچەڵەکو نازناوو بنەماڵەو موسڵمان بوونی ئەبی سوفیانی باوکی موعاویەو هیندی کچی عوتبەی کوڕی ڕەبیعەی دایکی معاویەو خوشك و براو هاوسەرو ڕۆڵەکانی و چۆنیەتی موسڵمان بوونی (معاویە) دەکات، دوایی هەندێك کارو کردەوە چاکەکانی دەژمێرێت و لە نێوانیشیاندا باس لە گێڕانەوەی

---

١ ال عمران (١٠٢).

٢ النساء (١).

٣ الاحزاب (٧٠-٧١).

فەرموودەکانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەکات لە لایەن معاویەوە (خوا لێی ڕازی بێت)، ئەمجا هەموو ئەو ڕیوایەتە ناڕاستانەش پوچەڵ دەکاتەوە کە سەبارەت بە زەمب‌و مەتحی (معاویە) دانراون، هەروەها ئەم کتێبە: قسە لەسەر ڕۆڵی (بەنی ئومەیە) دەکات لە سەردەمی پێغەمبەری خودا (ﷺ)و سەردەمی (خیلافەتی ڕاشیدە)دا، ئاماژە بەو کاتە دەدات کە ئەستێرەی معاویەی تێدا هەڵات، کە چۆن لە سەردەمی (عومەری کوڕی خەتاب)دا بوو بە والی (دیمەشق‌و بەعلەبەگ‌و بەڵقان)و، لاشی بە لای پەیوەندی نێوان ئەوو عومەری کوڕی خەتابدا کردووە خودا لە هەردووکیان ڕازی بێت، هەروەها تیشك دەخاتە سەر هەموو ئەو هەوڵو تێکۆشانانەی (معاویە) لە بەرەی شامداو لە سەردەمی ئەمیری ئیمانداران (عومەری کوڕی خەتاب)دا ئەنجامی داون، بە تایبەت دانانی سیستەمی هاوینە غەزاو زستانە غەزاو پێکهێنانی کەشتیرانیەکی ئیسلامی لە دەریادا. ئەمجا چالاکیەکانی (معاویە) لە سەردەمی (عوسمانی کوڕی عفان)دا، بە تایبەتیش سەرکەوتنە گەورەکانی پێشان دەدا ، ئەوەش دەخاتەڕوو کە چۆن (معاویە) بە ڕژدی داوای لە (عوسمان) دەکرد ڕێگەی پێ بدات غەزای دەریایی بکات. پاشان هێرشی سەربازی (معاویە) بۆ (قوبرس)و خۆ بەدەستەوەدانی دانیشتوانەکەی‌و ئەمجا هەڵوەشاندنەوەی سوڵحەکە لە لایەن قوبرسیەکانەوەو دوایش فەتحکرانی لە لایەن سوپاکەی معاویەوە باس دەکا، هەروەها ئەم کتێبە: حەقیقەتی ناکۆکیەکەی نێوان ئەبو زەڕو معاویە لە لایەکو هەڵوێستی (عوسمان) لە بەرامبەریدا لە لایەکی تر دەخاتەڕوو (خودا لە هەرسێکیان ڕازی بێ)، تەمومژی هەموو ئەو گومانانەش دەڕەوێنێتەوە کە لەدژی عوسمان دروستکراون، وەك: تۆمەتبارکرانی بە بەخشینی سامانی گشتی و پۆستە باڵاکانی دەوڵەت بە خزمە نزیکەکانی لەسەر حیسابی موسڵمانان. ئەمجا هۆکارەکانی فیتنەی (کوژرانی عوسمان) دەخاتەڕوو، وەك: هەرزانی‌و فەڕحانی‌و کاریگەریان لەسەر کۆمەڵگاو، سروشتی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی‌و هاتنە ئارای نەوەیەکی نوێ لە سەردەمی ئەوداو، ئامادەباشی کۆمەڵگا بۆ وەرگرتنی پڕوپاگەندەو ، هاتنی (عوسمان) بە دوای (عومەر)دا (خودا لێیان ڕازی بێت)و ، دەرچوونی هاوەڵە گەورەکان لە شاری (مەدینە)و ، دەمارگیری نەفامی‌و وەستانی فتوحاتی ئیسلامی بە هۆی بەربەستی سروشتی یان مرۆییەو، بە هەڵە تێگەیشتن لەچەمکی (وەرع)و ، دەرکەوتنی نەوەیەکی نوێ لە چاوچنۆکانو، پەیدابوونی گروهێکی هەڵگەڕاوەی ڕەشەکوژ لە داخلەدڵانو ، دانرانی تەگبیرێکی تۆکمەو دامەزراو بۆ هەڵایساندنی شۆڕش لە دژی (عوسمان)و بەکارهێنانی هەموو ئەو هۆکارانەی خەڵك لە دژی ڕاست دەکەنەوەو، ڕۆڵی (عبداللە ی کوڕی سەبەء) لە

هەڵایساندنی فتیلەی فیتنەکەداو، هەڵوێستی (معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان) لە بەرانبەریدا . پاشان دێتە سەر باسی ڕاوێژکردنی عوسمان بە والی هەرێمەکان‌و ڕای (معاویە) سەبارەت بە فیتنەکەو کوژرانی عوسمان‌و هەڵوێستی هاوەڵان لە بەرانبەریداو، ڕۆڵی (معاویە) لە سەردەمی (عەلی کوڕی ئەبو تالیب)دا ، ئەمجا باسی جیاوازی ڕای هاوەڵان دەکات سەبارەت بە شێوازی تۆڵەسەندنەوەی (عوسمان)و، ڕوودانی جەنگی (صفین)و چەند زنجیرە ڕووداوێکی تر، کە سەرەتاکەی بە نێردرانی کراسەکەی (عوسمان) دەست پێدەکات لە لایەن دایکی ئیمانداران (ئومو حەبیبەی کچی ئەبی سوفیان ) بە نوعمانی کوڕی بەشیردا بۆ موعاویەو خەڵکی شام‌و، هۆکارەکانی بەیعەتنەدان بە (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران (خوا لێی ڕازی بێت)و ڕەتکردنەوەی لە لایەن معاویەوە (خوا لێی ڕازی بێت)و ، ئامادەکردنی سوپا بۆ سەر شام لە لایەن (عەلی)و ناردنی (جریری کوڕی عبدالله) بۆ لای (معاویە) دوابەدوای جەنگی (جەمەل) بە مەبەستی بەیعەت لێ وەرگرتنی‌و، بەڕێکەوتنی (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران بە خۆی بە سوپاکەیەوە بەرەو شام و، دەرچوونی (معاویە) بەرەو (صفین)و، دەستپێکرانی قوڵە شەڕی نێوانیان‌و هەوڵەکانی هەردوو بەرە بۆ ئاشتیکردن‌و پاشان هەڵایسانی شەڕو کوشتارو ئەمجا جاڕدانی بە حەکەم کردنی (قورئان) لە نێوانیاندا، هەروەها ئەم (کتێبە) قسە دەکات لەسەر: کوژرانی عەمماری کوڕی یاسر (خوا لێی ڕازی بێت)و کاریگەری لەسەر موسڵمانان‌و، هەڵوێستی بەخشندانەی (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران لەبەرانبەر دیلەکانداو ، ژمارەی کوژراوەکان‌و بەسەرکردنەوەیان لە لایەن (عەلی)یەوەو دەربڕینی سۆزو پەرۆشی خۆی بۆیان‌و، هەڵوێستی (معاویە) لە بەرانبەر داوایەکی مەلیکی (ڕۆم) لە گەرمەی ڕووداوەکانداو ، چیرۆکێکی هەڵبەستراو دەرهەق بە (عەمروی کوڕی عاص) لە کاتی جەنگەکەداو، ڕژدبوونی بکوژانی (عوسمان) (خوا لێی ڕازی بێت) لەسەر بەردەوامبوونی جەنگ‌و، قەدەغەکردنی نەفرەت بە (معاویە)و (خەڵکی شام) لە لایەن (عەلی)ی ئەمیری ئیماندارانەوە (خوا لێی ڕازی بێت)و، بە حەکەمکردنی (قورئان)و، دەقی پەیمانەکەی (تەحکیم)و، چیرۆکە باوەکەی (تەحکیم)و پوچەڵکردنەوەی‌و، دەرخستنی حەقیقەتی بڕیاری (تەحکیم)و شوێنی تێدابەستنی کۆبوونەوەکە. هەروەها ئەم کتێبە ئاماژە دەکات: بە لوانی سود وەرگرتن لە ڕووداوەکەی (تەحکیم) بە خاتری کۆتایی هێنان بە گرژی‌و ئاڵۆزیەنێوخۆییەکانی نێوان دەوڵەتانی جیهانی ئیسلام. ئەمەو هەڵوێستی ئەهلی (سوننەت‌و جەماعەت)م سەبارەت بەم جەنگانە ڕوونکردۆتەوەو، قسەم لەسەر گۆڕانی پێوەرەکان‌و شکانەوەی لاباری بەرژەوەندیەکان کردووە بە لای (معاویە)دا لە دوای جەنگی

(صفین)ەوە. ئەمجا هاتوومەتە سەر باسی: ئاشتی نێوان (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران‌و (معاویە) (خودا لێیان ڕازی بێت)و ، شەهیدکرانی (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران‌و وەرگرتنی هەواڵی کوشتنەکەی لە لایەن (معاویە)وە، ئەمجا قسەم لەسەر (پرۆژە ئاشتیخوازو چاکسازیە گەورەکە)ی سەردەمی (حەسەنی کوڕی عەلی) کردووە کە چۆن بە هۆی خۆشبوونی (حەسەن) لەمافی پۆستی (خیلافەت)و چۆڵکردنی کورسیەکەی بۆ (معاویە) خودا لە هەردووکیان ڕازی بێت یەکێتی بۆ ئوممەت گەڕایەوە، ئاماژەشم بە قۆناغەکانی ئاشتی و مەرجەکانی‌و هۆکارەکانی‌و ئاستەنگەکانی‌و بەرهەمەکانی کردووە، بە هەمان شێوە تیشکم خستۆتە سەر ئەو زانایی‌و شارەزاییەی (حەسەنی کوڕی عەلی) هەیبووە سەبارەت بە فیقهی مەبەستەکانی شەریعەت(مقاصدالشریعە)و، فیقهی بەرژەوەندیەکان و تێکدەرەکان (فقەالمصالح والمفاسد)و، فیقهی جیاوازی (فقەالخلاف)، دەرم خستووە کە چۆن (پرۆژە چاکسازیە گەورەکە)ی لەسەر ئەم بنەمایانە دامەزراندو ، بەمەش ئوممەتی ئیسلامی پێی نایە نێو قۆناغێکی تازەوەو بەیعەتی دەستەجەمعی لە لایەن تێکڕای هاوەڵان‌و ڕۆڵەکانی ئوممەت بە (معاویە) درا، ئەمجا سیفەتەکانی (معاویە)م خستوونەتەڕوو کە گرنگترینیان: زانیاری‌و شارەزایی‌و نەرم‌و نیانی‌و لێبوردەیی‌و زیرەکی‌و فێڵزانی‌و ئەقڵێکی دەگمەن‌و ، توانایەکی باش بۆ کەمەندکێشکردنی جەماوەر و، خۆبەکەمزانی‌و خۆپارێزی‌و گریانی ئەو لە ترسی خوداو، هەموو ئەو ستایشانەشم باس کردوون کە زانایان دەرهەقی (معاویە) گوتوویانن، ئاماژەم بەوەش داوە کە دەوڵەتی ئومەوی دەکەوێتە بازنەی سێ سەدە هەرەباشەکە، کە پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەیان دەفەرموێ : ((خیرکم قرني، ثم الذین یلونهم، ثم الذین یلونهم)).[1] واتە: باشترینتان ئەو کەسانەن کە لە سەردەمی مندان، ئەمجا ئەو نەوەی دوای ئەوان دێن، ئەمجا ئەو نەوەی تر کە بە دوای ئەماندا دێن.

ئەمجا هاتوومەتە سەرباسی پایتەختی دەوڵەتی (ئومەوی)و، فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بە سیفەتە بەرزەکانی خەڵکی شام‌و ، ئەهلی مەشوەرەت (الحل والعقد) لە سەردەمی معاویەداو، ڕاوێژو ئازادی ڕادەربڕین‌و سیاسەتی نێوخۆ و، جوانرەفتارکردنی (معاویە) لەگەڵ هاوەڵە بەرزو بەرێزەکان‌و ڕۆڵەکانیان‌و، خۆشمامەڵەیی ئەو لەگەڵ (حسەن‌و حوسەین‌و عبداللە ی کوڕی زوبێرو عبداللە ی کوڕی عەباس‌و غەیری ئەوانیش ـ خودا لێیان ڕازی بێت ـ). پوچەڵی ئەو بوختانەشم خستۆتەڕوو کە دەڵێت :

---

١ البخاري، رقم (٦٦٩٥).

(معاویە) بڕیاری دابوو بە گشتی لەسەر مینبەری مزگەوتەکانو لە ڕۆژانی هەینیدا نەفرەت لە (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران بکرێت! ، هەندێك مێژوونووسیش دەڵێن: گوایە (معاویە) (حەسەنی کوڕی عەلی) ژارخواردوو کردووە! ، منیش بە بەڵگەی زانستیانە ناڕاستی ئەم هەواڵەم ڕوونکردۆتەوە، ئەمجا هەڵوێستی (معاویە)م خستۆتەڕوو لە بەرانبەر بکوژانی (عوسمان) پاش بوونی بە (ئەمیری ئیمانداران)و، کوژرانی (حیجری کوڕی عەدی) (خوا لێی ڕازی بێت)و، هەڵوێستی (خاتوعائیشە)ی دایکی ئیمانداران (خوا لێی ڕازی بێت) لە بەرانبەر کوژرانیداو، پاشان تیشکم خستۆتە سەر سووربوونی (معاویە) لەسەر ڕاپەڕاندنی کاروبارەکان بە خودی خۆیو چەسپاندنی هێمنایەتی لە خیلافەتەکەیدا. قسەم لەسەر: مەجلیسی ڕۆژانەیو دیوانە نێوەندیەکانی سەربەخۆیو دیوانەکانی نامەو مۆرو پۆستەو گەیاندنو سیستەمی دەرگەوانی[١] و پۆلیسو پاسەوانی کردووەو، کارامەیی ئەوم دەرخستووە لە هەڵبژاردنی پیاوانی تایبەت بەخۆییو، بەخشینی سامان بۆ ڕاگرتنی دڵو دەروونی یاریدەدەرەکانیو، پەیڕەوکردنی سیاسەتی توندیو نەرمیو، ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی بەرانبەر لە نێوان بەنی ئومەییەو شوێنکەوتووانیانو، بەکارهێنانی سیاسەتی ڕاگەیاندن بۆ بەرزکردنەوەی ناوو ناوبانگی خۆیو خیلافەتەکەی. ئەمەو کارێکی وای کرد خەڵك دەوروەیان لێ بدەنو، گرنگی دا بە دامو دەزگای هەواڵگریو دامەزراندنی سوپای ئیسلامیو گەشەپێدانی، ئەمجا باسی ئەو شارەزاییە بەرفراوانەیم کردووە کە لە سیاسەتی هەڵسەنگاندنی هۆزو تیرەو تایەفەکانو کەسایەتیەکانی کۆمەڵگادا پەیڕەوی لێ دەکردو وێڕای ئەمەش چۆنیەتی سیاسەتی جوڵانەوەیم لە بەرانبەر بنەماڵەی ئومەویدا شی کردۆتەوە، پاشان چۆنیەتی ژیانو گوزەرانی ئەوم لەنێو کۆمەڵگاداو بایەخدانی بە بوارەکانی زانستو مێژوو هۆنراوەو زمانەوانیو زانستە ئەزموونیەکانم خستوونەتەڕوو، هەروەها چەند باسێکم بۆ مەسەلەی پەیوەندی (معاویە) لەگەڵ (خەواریج) تەرخان کردوونو هەموو ئەو هۆکارانەشم باس کردوون کە بۆ لاوازکردنو بچووککردنەوەی ڕۆڵی ئەوانی خستبوونەگەڕ، دوای ئەمە تیشکم خستۆتە سەر (سیستەمی دارایی) سەردەمەکەیو سەرچاوەکانی دەرامەتەکەی، وەکو (زەکاتو سەرانەو باجو دەیەكو داهاتی زەویەکانی دەوڵەتو دەستکەوتەکانی جەنگو هتد..)، خەرجیە گشتیەکانی گشتی وەکو خەرجیەکانی لایەنی سەربازیو ئیداریو کۆمەڵایەتیو هتد، هەروەها ڕوونم کردۆتەوە کە چۆن (معاویە) بایەخی

---

١ الحجاب: ئەمڕۆ بە عەرەبی (استعلامات)= واتە پرسگەی پێ دەوترێت. وەرگێڕ.

بە کشتوکاڵ‌و بازرگانی نێوخۆو دەرەوەو پیشەسازی داوە، ئەمجا هاتوومو بە ویژدانەوە گفتوگۆیەکی زانستیانەم لەسەر هەموو ئەو گومان‌و تۆمەتانە کردووە کە سەبارەت بە چۆیەتی خەرجکردنی دارایی گشتی لە سەردەمی معاویەدا وروژێنراون، وەك: جیاوازی لە بەخشینداو درۆو دەلەسەی بەخشینی (مصر) وەك (پارویەکی گەرم ونەرم) بە (عەمروی کوڕی عاص)و، دەستبڵاوی لە بەخشینی سامان بە خاتری ڕاکێشانی لایەنگران‌و دڵڕاگرتنیان‌و دیاردەی خۆشگوزەرانی ئومەویەکان، هەروەها باسێکم بۆ (قەزاوەت)ی سەردەمی معاویەو دەوڵەتی ئومەوی تەرخان کردووەو پەیوەست بوونیم بە قەزاوەتی سەردەمی (خیلافەتی ڕاشیدە)وە سەلماندووە، دەرم خستووە کە چۆن خەلیفەکان نە زۆر نە کەم پەیوەندیان پێوە نەبووەو دەسەڵاتێکی سەربەخۆ بووەو، پلەبەندی قازیەکان‌و تۆماری حوکمەکان‌و شایەتیدان لەسەریان‌و یاریدەدەرانی قازیەکان وەکو بانگهێشتکەرو دەرگەوان‌و تەرجەمان‌و چاوەدێری‌و بەدواداچوون‌و سەرچاوەکانی ئەحکامی قەزاوەت‌و تایبەتمەندی قازیەکانم خستۆتەڕوو، ناوی قازیە بەناوبانگەکانی سەردەمی (معاویە)م هێناوەو، ئاماژەم بە سیفەت‌و مەرجەکانی قەزاوەتی سەردەمی (معاویە) بە تایبەتی‌و (ئومەویەکان) بە گشتی کردووەو، لێدوانەکەی (عمری کوڕی خەتاب)یشم هێناوە کە سەبارەت بە (قەزاوەت) ئاراستەی (معاویە)ی کردبوو، هەروەها قسەم لەسەر دەزگای (پۆلیس)ی سەردەمی (معاویە)و ئەرکەکانی کردووە، وەك: پاسەوانی کردنی خەلیفەو والی هەرێمەکان‌و سزادانی تاوانباران‌و سەرپێچیکارانی قانون‌و جێبەجێ کردنی سزا شەرعیەکان، هەروەها دەربارەی چەند دەزگایەکی تریش دواوم‌و پەیوەندی ئەوانیشم بە دەزگای (پۆلیس)ەوە ڕوون کردۆتەوە وەك دەزگاکانی: پاسەوان‌و عەریفەکان‌و دزدیاریکەران (صاحب الاستخراج)و، شورتەی بازاڕو سیستەمی چاودێری‌و پۆلیسی ڕێگاوبانە چۆڵەکان (الدرك)و، ئەمجا باسی دامەزراوەکانی ئیدارەو والیەکان‌و گرنگترین هەرێمەکانی سەر بە دەوڵەتەکەی (معاویە)م کردووەو ناوی والیە بەناوبانگەکان‌و گرنگترین شارو شارۆچکەی سەر بەو هەرێمانەم تۆمار کردوون، کاتێك قسەم لەسەر شاری (مەدینەی نەبەوی) کردووە ژیاننامەی کەسایەتی (ئەبو هورەیرە) (خوا لێی ڕازی بێت)م خستۆتەڕوو کە لە ساڵی (٥٨ك) یان (٥٩ك) لەوێدا مردووەو نزیکەی (١٨) ساڵیش لە سەردەمی (معاویە)دا ژیاوە، ئەم هاوەڵە مەزنەی بە گەورەترین گێڕەرەوەی (سوننەتی پیرۆزی نەبەوی) دادەنرێت، ناساندوومەو کەمێك لە بوارەکانی ژیاننامەکەیم خستۆتەڕوو، وەك: (پەرستن‌و خۆپارێزیەکەی‌و نەرم‌و نیانی‌و لێبوردنەکەی، هەروەها گرنگیدانی بە زانست)، بەرپەرچی

هەموو ئەو تۆمەتانەم داوەتەوە کە بە ئامانجی گومان خستنەسەر سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەر (ﷺ) لەدژی ئەم هاوەڵە وروژێنراون‌و، بە هەوای نەفس تیروتانەیان تێگرتوون، زمانحاڵی من لە مەیدانی مشتومڕی ئەم درۆزنانە قسەی شاعیرە کە دەڵێت:

وإذا اضطررت على الجدال ولم يجد لك مهرباً وتلاقت الصفان
فاجعل كتاب الله درعاً سابغاً والشرع سيفك وابد في الميدان
والسنة البيضاء دونك جنة واركب جواد العزم في الجولان
واثبت بصبرك تحت ألوية الهدى فاصبر أوثق عدة الانسان
واطعن برمح الحق كل معاند لله در الفارس الطعان
واجعل بسيف الصدق حملة مخلص متجرداً لله غير جبان

ئەمجا بزوتنەوەی (فتوحات)ەکەی سەردەمی (معاویە)م وەسف کردووەو لە پێشەکیەکیشدا وتوێژێکم لەسەر هەموو ئەو درۆو دەلەسەو پوختانانە کردووە کە بەم فتوحاتانەوە لکێنراون، بێگومان (معاویە) (خوا لێی ڕازی بێت) تێکۆشا تا هەموو ئەو دەستکەوتە مەزنانەی شەپۆلی یەکەمی بزووتنەوەی فتوحات کە بە پلان و سەرکردایەتیکردنی خەلیفە ڕاشیدەکان بەدیهاتبوون بپارێزێت‌و پێیانەوە زیاد بکات ، خۆ نەخشەی دووەمی بزووتنەوەی (فتوحات) لە سەردەمی خودی معاویەدا دەستی پێکردو دوایەش بەردەوام بوو تا لە سەردەمی (وەلیدی کوڕی عبدالملك)دا گەیشتە ئەوپەڕی فراوانی، دوایی هاتووم وەسفێکی ئەو بزووتنەوە جیهادیەم کردووە کە (معاویە) لە دژی دەوڵەتی (بێزەنتی) ڕاپەڕاندو گرنگی بە فەتحکردنی (قوستەنتینیە)دەداو نەخشەی ستراتیژی دەکێشا تا دەستی بەسەردا بگرێت‌و بە خاتری ئەمە بایەخی بە (کەشتیرانی)و پیشەسازی (کەشتی)دا لە (مصر)و (شام)و سەنگەری سەر سنوورە دەریاییەکانی پێ قایم دەکردن‌و دەستی بەسەر دورگە هەڵکەوتووەکانی خۆرهەلاتی دەریای نێوەڕاست داگرت‌و قەراغەکانی باری سەرەوەی باکووری مەحکەم کردن‌و گەمارۆی (قوستەنتینیە)ی داو، (ئەبو ئەیوبی ئەنساری)یش (خوا لێی ڕازی بێت) لە ماوەی گەمارۆدانەکەدا کۆچی دوایی کرد، (ئەبو ئەیوب) وەسیەتی کردبوو لەوپەڕی باری پێشەوەی خاکی دوژمن بینێژن، ئەمە نموونەیەکی جوانەو بەڵگەیە لەسەر پەیوەندی توندو تۆڵی ئەو بە جیهادەوە، ئەمەو بە مردوویش لە دارەبازەکەیدا لەنێو ڕیزی موجاهیداندا بووو بەسەر شانی ئەوانەوە بوو، بەم شێوەیە چۆن لە ژیانیدا خۆی بەنێو خاکی دوژمندا دەکرد دەیەویست بە مردوویش ئەمە بکات، وەکو ئەمە ئەوەندەی لە ژیانیدا ئەنجامیداوە بەشی نەکردبێت‌و ویستبێتی دوای

مەرگیشی بەشی هەبێت، بەمە واتایەکی پڕبەپێستو ڕاستو دروستی کردە بەرگو بەبەر چەمکی (موجاهیدی ڕاستەقینە)ی داکرد.

بەڵێ: (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) بە هێرشو پەلامارە یەکلەسەر یەکە دەریاییو وشکانیەکانی توانی تەنگ بە دەوڵەتی (بێزەنتی) هەڵبچنێتو شپرزەیان بکاتو تاڵاوی ترسو تۆقاندنو دڵەڕاوکەیان بە گەروودا بکاتو زیانی گەورەیان لێ بدات، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا بە هۆی ژمارەیەك هۆکار (کە لەمەودوا بە ئیزنی خودا خوێنەر دەیانخوێنێتەوە) نەیتوانی خۆ بە نێو شاری (قوستەنتینە)دا بکاتو فەتحی بکات، ئەمجا (معاویە) لەگەڵ دەوڵەتی (بێزەنتی) کەوتە نێو پەیوەندی ئاشتیو نامەو نامەکاریو هاتوچۆی نوێنەرانو ئاڵوگۆڕی شارەزاییو زانستەکان، بەڵام لەسەر (فتوحاتەکانی) لە باکووری ئەفریقیا بەردەوام بوو، هێرشەکەی (معاویەی کوڕی حەدیج) (خودا لێی ڕازی بێت) لە سەردەمی ئەودا دەستی پێ کردو ناوی (عوقبەی کوڕی نافع) لە ماوەی ئەو فتوحاتانەدا دەرکەوتو لە سەردەمی (معاویە)دا شاری (قەیرەوان)ی لە (تونس)ی ئەمڕۆ دروست کرد، ئیدی (قەیرەوان) بوو بە مەڵبەندێکی پڕشنگداری شارستانی لە (مەغریب)داو بوو بە پایتەختی زانستی ئەو وڵاتە، ئەمەو خوێنەر لەگەڵ فتوحاتی (باکووری ئەفریقیا) دەڕوات تا شەهیدبوونی (عوقبە) (خودا ڕەحمی پێ بکات)، هەروەها باسی فتوحاتەکانی (معاویە)م کردووە لە باری خۆرهەڵاتی دەوڵەتی (ئومەوی)دا لە (خۆراسانو سوجستانو ئەودیو ڕووبار ـما وراء النهرـ)و، وڵاتی (سند)و گرنگترین وانەو پەندو سودەکانی ئەم (فتوحات)انەم کورت کردوونەتەوە، گرنگترینیان: کاریگەری ئایەتو فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر دڵو هەناوی موجاهیدان، سوننەتو ڕێوشوێنی خودا لە (فتوحات)دا، وەك سوننەتی خودا لە بەرامبەر (یەکێتیو کۆکبووناو بەرگری لە یەکتری کردنو دەستگرتن بە هۆکارەکانەوە)و ، هەروەها سوننەتی خودا لە بەرانبەر (ستەمو ستەمکارانو خۆشگوزەرانانو سەرپێچیو سەرپێچیکاران)، هەروەها سوننەتی خودا لە بەرانبەر ڕێوشوێنی پلەپلەییو گۆڕینی دەروونەکانو نەخشەی ستراتیژی (معاویە) بۆ (فتوحات)و سیاسەتی ئەو لە بەرانبەر (ڕۆم)و بەرەی باکووری ئەفریقیو بەرەی سوجستانو خۆراسانو ئەودیوڕووبارو بەڕێوەبەرایەتیە راوێژیەکەی لە بزوتنەوەی (فتوحات)داو یەکناوەندی سەرکردایەتی ئیدارەکەیو کۆمەك وەرگرتن لێیو سیستەمی ئاڵاو بەیداخداریو گرنگیدانی بە هەواڵگریو پۆستەو گەیاندنو سنوورە وشکانیەکانی دەوڵەتەکەیو، بایەخدانی بە کەشتیرانیو سنوورە دەریاییەکانو

دیوانی سەربازیو تۆماری موچەو کاریگەری زانستی ئابووریو کۆمەڵایەتی لە سەردەمی ئەودا، هەروەها قسەم لەسەر هەندێك کەرامەتی موجاهیدانی سەرودەمی ئەو کردووە.

بێگومان لەو کارو پڕۆژانەی (دەوڵەتی ئومەوی) ئەنجامیدان هەر لە سەردەمی (معاویە)وە تا سەردەمەکانی (عبدالملك)و (ولید)و (سلیمان)ی کوڕی (عبدالملك) بریتیە لەو (فتوحات)ە مەزنانەی لەسەر دەستی ئەوان ئەنجام دران، خاکی جیهانی ئیسلامی لە بەشی ڕۆژهەڵاتەوە تا (چین)و لە بەشی ڕۆژئاواوە تا (ئەندەلوس)ی (باشوری فەرەنسا)ی پێ فراوان کرا، خەلیفەکان کوڕەکانی خۆیان بۆ جیهاد دەناردن، ئامادەی جەنگەکان دەبوونو هاوەڵە بەڕێزەکانو شوێنکەوتووە ناودارەکان لەنێو ڕیزی ئەو سوپایانەدا بوون، بزووتنەوەی فتوحات لە لایەن دەوڵەتەوە سەرپەرشتی دەکراو ئەندامانی کۆمەڵگا بە هەموو ڕەنگەکانیەوە لە زانایانو بازرگانانو دنیا نەویستانو خوداپەرستان ئاوێتەی ببوون، ئیتر سوپاکان بەرەو ناوچەکانی خۆرهەڵاتو خۆرئاوا بەڕێکەوتنو بە دەستی پڕ لە دیاری دادپەروەریو خێروبێرەوەو، جێبەجێ کردنی داخوازیەکانی ڕوحو ڕەوانو جەستەوە بەرەو لای گەلە زۆرو زەوەندە هاوسێکان پێشڕەویان کردو (ئیسلام)یان بە خەڵات بۆ بردن کە بەوپەڕی واتای تێرو تەواوو ڕاستو دروستەوە بڕیار لەسەر مافەکانی مرۆڤایەتی دەدا لەم سەر زەمینەدا ، لەبەر ئەمە (ئیسلام)زۆر بە خێرایی لە نێویاندا بڵاو بۆوەوکاریگەری گەورەی لەسەر دەر ودەروون دانان ، فەتحکاران نیشانیاندان کە ئەو دینەی هاوەڵانی (محمد المصطفی) (ﷺ)ی بەختەوەر و کامەران کرد، ئەوانیش بەهەواری سەرفراز ی دەگەیەنێ.

شاعیر دەڵێت:

| | |
|---|---|
| الله أكـــبر إن ديـــن محمد | وكتابه أقـــوى وأقــوم قيلاً |
| طلعت به شمــس الهداية للورى | وأبى لها وصـف الكمال أفولا |
| والحق أبلـــج في شريعتـــه التي | جمعــت فروعــاً للهدى أصولاً |
| لا تذكروا الكتب السوالف عنده | طلع الصباح فأطفئوا القنديلا |

لە ڕاستیدا (فتوحات)ە مەزنەکانی سەردەمی (معاویە)و دەوڵەتی ئومەوی بەڵگەیەکی بەرهەستە لەسەر زیندوویەتی ئۆممەتو ئاوێتەبوونی لەگەڵ دینی خوداو سووربوونی لەسەر هیدایەتدانی گەلان.

ئەمەو گفتوگۆم لەسەر فیکرەی (ویلایەتی عەهد)و هەموو ئەو هەنگاوانە کردووە کە (معاویە) بۆ وەرگرتنی بەیعەت بۆ زەید هەڵیناون لە: ڕاوێژکردنو هەڵمەتی پڕوپاگەندەو

قبوڵکردنی بەیعەتدان بە یەزید لە لایەن دانیشتوانی (شام)ەوەو بەیعەتدانی وەفدەکان‌و، داواکردنی بەیعەت لە خەڵکی (مەدینە)و، بەرهەڵستکردنی لە لایەن (عبداللە ی کوڕی عمر، عبدالرحمن ی کوڕی ئەبو بەکر، عبداللە ی کوڕی زوبێر، حوسەینی کوڕی عەلی –ڕەزای خوایان لێ بێت–)، ئەمە لەگەڵ خستنەڕووی هۆیەکانی دیاریکردنی (یەزید) لە لایەن (معاویە)ی باوکیەوە، وەك: (پاراستنی یەکێتی‌و یەکپارچەیی ئوممەت‌و هێزی دەمارگیری وتیرەگەری‌و خۆشویستنی یەزید لە لایەن باوکیەوەو قەناعەتلەسەربوونی). ئەمجا ئەو ڕەخنانەم باس کردوون کە سەبارەت بە بەیعەتوەرگرتن بۆ یەزید ڕووبەڕووی (معاویە) کراون‌و ئەو گازندانەشم وروژاندوون کە دەربارەی داهێنرانی فیکرەی (ویلایەتی عەهد) لە سەردەمی معاویەدا دەربڕدراون، پاشان قسەم لەسەر دواڕۆژەکانی ژیانی (معاویە)و، پاڕانەوەی سەرەمەرگی کردووە کە دەیوت: (خودایە لە هەڵخلیسکانەکانم ببوورە، چاوپۆشی لە گوناهەکانم بکە، بە نەرم‌و نیانی‌و سۆزو بەزەیی خۆت لە نەفامیەکانم ببوورە، جگە لە زاتی تۆ کەس جێی ئومێد نیە، تۆ بازنەی لێخۆشبوون‌و لێبوردنت فراوانە لە بەرانبەر کەسێکدا بە تاوانەوە بۆ لات دەگەڕێتەوە)، ئەمجا وەفاتی کرد.

هەروەها کتێبەکە: باسی سەردەمی (یەزیدی کوڕی معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان) دەکات‌و، گرنگترین سیفەتەکانی (یەزید)و چۆنیەتی بەیعەتپێدانی‌و، هەڵوێستی (حوسەینی کوڕی عەلی‌و عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر) لە بەرانبەریدا دەخاتەڕوو، پاشان هۆکارەکانی دەرچوونی (حوسەین)و ئەو (فتوا)یەش کە حوکمی دەرچوونەکەی لەسەر دامەزراندو، بڕیارە یەکلابووەکەی لەسەر دەرچوون بەرەو (کوفە)و ئامۆژگاری هاوەڵان‌و شوێنکەوتوان بۆ ئەو و دەرخستنی ڕاکانیان سەبارەت بە دەرچوونەکەی باس دەکات، ئەمجا دەربارەی هەڵوێستی (یەزید) دەدوێ لە بەرانبەر ڕووداوەکانی (کوفە)و، ڕۆڵی (عبیداللە ی کوڕی زیاد) لە کوشتنی (موسلیمی کوڕی عوقەیل)و قەڵاچۆکردنی لایەنگرەکانی‌و، کارەساتەکەی جەنگی (کەربەلا)و، شەهیدکرانی (حوسەینی کوڕی عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت)و، ئەو هەڵوێستە جوانانەی کە لایەنگری حوسەینیان دەکردو، هەڵوێستی (یەزیدی کوڕی معاویە) لە بەرانبەر کوژرانیداو، چۆنیەتی ڕەفتاری ئەو لە بەرانبەر خانەوادەو ڕۆڵەکانی (حوسەین)دا. ئەمجا دەرمخستووە کە ئۆباڵی کوژرانی (حوسێن) لە ئەستۆی کێدایەو، قسەی خەڵکیم دەرهەق بە (یەزیدی کوڕی معاویە) هێناون‌و، وەڵامی ئەو پرسیارەم داوەتەوە کە دەڵێت: ئایا دروستە نەفرین لە (یەزید) بکرێت؟، هۆشداریم داوە لە بەرانبەر ئەو چیرۆکانەی سەبارەت بە کوژرانی حوسێن ﷺهەڵبەستراون ، ئەمجا گرنگترین وانەو پەندەکانی ژیاننامەی (حوسێن)م لە چەند خاڵێکدا

داناون، کە گرنگترینەکەیان: سوننەتی پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە ڕۆژی (عاشورا)داو، ئادابی هەڵسوکەوت لەگەڵ موسیبەتەکان لە ئیسلامداو، لێکۆڵینەوە لە شوێنی سەری (حوسێن)و، حوکمی ئیسلام سەبارەت بە پیرۆزدانانی گۆڕی ئیمامەکانو، سەردانی گۆڕەکەی (حوسێن)و، بە پیرۆزدانانی (کەربەلا)و، ڕێنمایەکانی ئیسلام بۆ سەردانی گۆڕستانو، حوکمی دروستکردنی خانوو لەسەریانو کرانی ئەو خانووانە بە مزگەوت.

بەڵێ باسی دەرچوونەکەی (حوسێن) ﷺو قۆستنەوەی ئەم دەرفەتە بۆ کوشتنی لەلایەن هێزە نەیارەکانی ئیسلامو کارەساتەکەی (کەربەلا)م کردووە.

ئەمجا قسەم کردووە لەسەر: ڕووداوەکەی (حَرَّة)و، هەموو ئەو وتانەش دەربارەی هەتککرانی شەرەفو ناموس لەو ڕووداوەدا وتراونو، هۆکارەکانی شکستی خەڵکی (مەدینە) لە جەنگەکەدا. هەروەها قسەم کردووە لەسەر: بزووتنەوەکەی (عبدالله ی کوڕی زوبێر)ﷺ لە سەردەمی (یەزید)دا، هۆکارەکانی هەڵبژاردنی (مەکە) وەك بنکەی بەرهەڵستکاری حوکمی ئومەوی بۆ بزووتنەوەکەیو، هۆیەکانی دەرچوون لە دژیو، هەوڵە ئاشتی ئامێزەکانی (یەزید) بۆ گێڕانەوەی (عبدالله)و، پاشانیش هەوڵە شەڕەنگێزیەکانی لە بەرانبەریداو، گەمارۆدانی (کەعبە)و بۆردومانکردنی بە (مەنجەنیق)و سوتاندنیو، پاشایش مردنی کتوپڕی (یەزیدی کوڕی معاویە).

ئەمجا گفتوگۆم کردووە دەربارەی: (خیلافەتی معاویەی کوڕی یەزید)و ماوەی حوکمگێڕانیو دابەزینی لە پۆستی خیلافەتو بەجێهێشتنی ئەم پۆستە بۆ شورا.

لە خودای بەرزو بڵند دەپاڕێمەوە ئەم کارەم قبوڵ بفەرموێتو، سنگی بەندەکانی بۆ واڵا بکاتو، سودی لێ وەربگرنو ، بە دەستی بەبەخششو سەخاوەتو فەڕی خۆی فەرداری بکات. خودای بەرز دەفەرموێت: ﴿ مَّا يَفْتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ لَهَا ۖ وَمَا يُمْسِكْ فَلَا مُرْسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢﴾ ﴾[1].

شتێکی ترم نەماوە لە کۆتایی ئەم کتێبەدا بیڵێم جگە لەوە: بە دڵێکی داخوڕپاوو ملێکی کەچەوە لەبەردەم پەروەردگارم بوەستمو دان بە بەخششو سەخاوەتی ئەو زاتەدا بنێمو، تەبەڕپا لە هەوڵو هێزو وزەی خۆم بکەم، خوای بەرزو بەخشندە پشتیوانو سەرخەرە، لە سەرەتاو کۆتاییدا سوپاس بۆ ئەو لە بەرانبەر هەموو ئەو خێرو چاکەی لەگەڵیدا کردم، بە ناوە جوانەکانیو سیفەتە بڵندەکانی لێی دەپاڕێمەوە ئەم کارەم پوختو پاك لەبەر ڕووی

---

١ الفاطر (٢).

پیرۆزی بێت‌و بۆ بەندەکانی سوودبەخش بێت‌و دەرهەق بە هەر شتێك نوسیومە پاداشتم بۆ بنووسێت‌و بیخاتە نێو تا تەرازووی کردەوە چاکەکانمەوەو پاداشتی هەموو ئەو برایانەشم بداتەوە کە لە تێرو تەواوکردنی ئەم هەوڵە کەمەدا هاریکاریان کردم، هیوادارم هەر موسڵمانێك ئەم کتێبە دەخوێنێتەوە منی بەندەی هەژار بۆ لێخۆشبوون‌و لێبوردنی پەروەردگار لە یاد نەکات‌و لە نزای خۆیدا بێ بەشم نەکات، چونکە نزای پاشەملەی برا بۆ برا بە ویستی خودا وەردەگیرێت، ئەم کتێبە بەم ئایەتە پیرۆزە سەرمۆر دەکەم: ﴿رَبِّ أَوْزِعْنِيٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾[١].

سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا إله إلا أنت أستغفرك وأتوب إليك، وآخر دعوانا الحمد لله رب العالمين.

ئاتاجی سۆزو بەزەیی‌و ڕەزاو
لێخۆشبوونی خودای پەروەردگار
علي محمد محمد الصلابي

---

١ النمل (١٩).

## بسم الله الرحمن الرحيم

# ڕەگە مێژووییەکانی بنەماڵەی ئومەوی

ئومەویەکان دەدرێنە پاڵ: (ئومەوییە)ی کوڕی (عبدالشمس)ی کوڕی (عبدمناف)، ئەم تیرەو تیرەی هاشمیەکان لە (عبدمناف)دا بەیەك دەگەن، ڕۆڵەکانی (عبدمناف) مەڵبەندی سەرۆکایەتی (مەککە)یان بە دەستەوەبوو، لە لایەن هیچ کەسو تیرەیەکی ڕەسەنی هۆزی (قورەیش) شانیان لە شان نەدەدرا، هەموو (قورەیش)یش ئەمەی دەزانیو سەرۆکایەتی کردنی ئەوانی دەسەلماند.[1]

## یەکەم: گەواهیدانی مێژوو لەنێوان هاشمیەکانو ئومەویەکان:

ڕۆڵەکانی (عبدمناف) بە تەنیا هەوڵیان دەدا پۆستەکانی دەسەڵاتی (مەککە) -کە بە دەست ئامۆزاکانیان واتە ڕۆڵەکانی (عبدالدار)ی کوڕی (قصي)ەوە بوو- دابەش بکەن، کاتی خۆی (قصي) باپیرە گەورەیان (عبدالدار)ی بەسەر هەموو کوڕەکانیدا هەڵبژاردبوو، هەرچەندە هەموویان لە ئەو شکۆمەندتر بوون، بەڵام باوکیان تەواوی پۆستەکانی دەسەڵاتی (حجابة ، لواء ، سقاية ، رفادة)ی بە ئەو بەخشیبوون.

(عبدشمس)ی بابی (ئومەییە) -بە حوکمی ئەوە بە تەمەنترین کوڕی (عبدمناف) بوو- سەرۆکایەتی ئەم کێشمەکێشمەی دەکرد، لەم بێنەوبەرەدا قورەیش بوو بە دوو بەشی ناکۆك، واتە: (عبدمناف)و (عبد دار)، پاشان هاتنە سەر سفرەی ئاشتی و، لەسەر ئەوە پۆستەکانی (سقایە ، رفادە) بۆ ڕۆڵەکانی (عبدمناف) بنو پۆستەکانی (حجابە، لوا ، ندوة)ش بۆ ڕۆڵەکانی (عدالدار) بمێننەوە ڕێککەوتن، لەبەر ئەوە (هاشم) دەوڵەمەندو خۆشگوزەران بووو، لە لایەکی تریشەوە (عبد شمس) پیاوێکی گەڕیدە بوو بە کەمی لە (مەککە) نیشتەجێ بووو هەژار بووو خاوەن ماڵو منداڵێکی زۆر بوو، ئەوا ئەودوو پۆستەی بەر ئەوان کەوتبوون لە (رفادەو سقایە) لەلایەن (هاشم)ەوە بەڕێوە دەبران.[2] بەم شێوازە دەسەڵات لە (مەککە)دا بریتی بوو لە چەند مەڵبەندێکی دەستڕۆیشتوو کاریگەری ستراتیژی ئابووری و بەسەر بڕیارەکانیەوەڕەنگی دابۆوە، ئەو دەسەڵاتە ڕەهایەی (قصي) سەرۆکی یەکەمی قورەیشیش هەیبوو هیچ کەسایەتیو خانەوادەیەکی قوڕەیش نەیبوو،[3]... بە هەمان

---

١ النجوم العوالي للعصامي (٣/٢).

٢ السيرة النبوية لابن هشام (١/١٣٧-١٣٨، ١٤١).

٣ الحجاز والدولة الاسلامية (ص:٨٧).

شێوە ڕۆڵەكانی (عبدمناف) بوون بە برابەشی ڕۆڵەكانی (عبدالدار) لە ڕێكخستنی بازرگانی نێوان (مەككە)و دەوروبەریدا.[١]

ئیدی لەمەولا بە لەیەككەیشتن‌و یەككرتن بوونە یەكدەست‌و كاتێك مردویان دەبوون، شاعیران وەكو یەك‌و بێ جیاوازی شیعری شینیان بۆ دەهۆنینەوەو لە حاڵەتی ئاساییشدا وەك یەك ستایشیان دەكردن.[٢] سروشتی ژیانی عەرەبەكانی سەردەمی نەفامی ئاوای دەخواست كە بەرەبابەكان (واتە ڕۆڵەو نەوەكانی یەك باپیرە)پشتگیری یەكتر بكەن‌و هەموو ڕێوشوێنێكی لەبار بگرنەبەر بۆ یەكخستنی بڕیاریان،[٣] هەموو ئەو ڕیوایەتانەش كە دەڵێن: گوایە دوژمنایەتیەكی خەستوخۆڵ لە نێوان ڕۆڵەكانی (هاشم)و ڕۆڵەكانی (عبدشمس)و (أمیە)دا هەبووە چەسپاو نین‌و سەنەدەكانیان نەناسراون، یەك لەو ڕیوایەتانە دەڵێت: (هاشم)و (عبدشمس) بە پێكەوەنووساوی‌و دوانە لە دایك بوون‌و بە شمشێر لێكیان كردوونەتەوە، لەبەر ئەمە خوێن لە نێوان ڕۆڵەكانیاندا دەڕژێت.[٤] ئەم ڕیوایەتە بیژۆكەو گێڕەرەوەی نیەو بۆنكرۆزوی ئەفسانەی لێ دێت، ئەم ڕیوایەتەی (ابن إسحاق) هێناویەتی بە درۆی دەخاتەوە: كە دەڵێت (عبدشمس) بە تەمەنترین ڕۆڵەی (عبدمناف) بوو،[٥] ئەو دوو ڕیوایەتانەش كە دەڵێن: دژایەتی كەوتبووە نێوان (هاشم)و (ئومەییە)ی كوڕی (عبدشمس)و نێوان (عبدالمطلب)ی كوڕی (هاشم)و (حرب)ی كوڕی (ئومەییە)،[٦] ئەوا هەردووك ڕیوایەتەكە لە (هوشامی كەلبی)یەوە ڕیوایەت كراون‌و زنجیرەی ڕیوایەتكەرەكان نەناسراون‌و ناوەكانیان نازانرێن، بە هەڵبەستراوی شیعە درۆزنەكان دادەنرێن.[٧]

وەك دیارە ئەم ڕیوایەتانە: سەنەدەكانیان نەخۆش (معتل)ن‌و دەقەكانیشیان ئاوازدارن‌و دەنگدانەوەیەكە بۆ ئەو ڕووداوانەی كە پاشان ڕوویاندا لە ململانێی نێوان ڕۆڵەكانی (ئومەییە)و ڕۆڵەكانی (هاشم)دا، ڕیوایەتكەرەكان هەوڵیانداوە سەنەدێكی مێژوویی چەسپاوی

---

١ تاريخ الطبري (٢/٢٥٢).
٢ السيرة النبوية لابن هشام (١/١٤٤ـ١٤٨).
٣ الدولة الاموية المفترى عليها (ص:١٢٢).
٤ النزاع والتخاصم للمقريزي (ص:١٨١).
٥ السيرة النبوية لابن هشام (١/١٣٧).
٦ النزاع والتخاصم للمقريزي (ص:٨١)، الدولة الاموية، شاهين (ص:١٢٢).
٧ الدولة الاموية المفترى عليها (ص:١٢٢).

لەسەر بێننو ئەو پەیوەندیە خۆشە حاشا هەڵنەگرەی نێوان هەردوولا بشێوێنن،[1] لەبەر ئەمە (إبـن خلـدون) دەڵێـت: ڕۆڵـەکانی (عبـدمناف) لـەنێو (قـوڕەیش)دا ڕسـتـەیەك سـیفەتو شـکۆمەندییان هـەبوون، کەسـێك لـە قورەیـشیە ڕەسـەنەکان بەریـەرەکانێی نـەدەکردن، ڕۆڵەکانی (ئومەییە)و ڕۆڵەکانی (هاشم)، دوو باڵی سەر بـە (عبـدمناف) بـوونو دەدرانـە پـاڵ ئەو، (قوڕەیش) ئەمەی دەزانیو داوای لێ دەکردن ئەوان سـەرۆکایەتی بکـەن، هەرچـی بـاڵی بـەرەبابی (ئومەییـە) بـوون لــە ڕووی ژمــارەوە لــە بــاڵی بــەرەبابی (هاشــم) زۆرتــرو دەستڕۆیشتووتر بوون، شاعیریش دەڵێت: دەسەڵات بۆ ئەو کەسەیە جەماوەری زۆرە.[2]

پێ دەچێت ئەم ئاماژەی (ابـن خلـدون) سـەبارەت بـە سـەرکەوتنی (بـەرەبابی ئومەییـە) کەمێك پێش نێردرانی پێغەمبەر (ﷺ)و بە مردنی (عبدالمطلبی کوڕی هاشم) (کـە میراتگـری پۆستە بەرزەکەی باوکی بوو) ڕوویدابێت، ئیدی دوای ئەمەئەستێرەی (ئـەبو سـوفیانی کـوڕی حەرب)ی بـە دوادا هـەڵات، ئـەم وەسـفە پـڕ وردەکاریـە سـەبارەت بـە سروشـتی پەیوەنـدی خزمایەتی نێوان (بەنی ئومەییە)و (بەنی هاشم) لەسەر زمانی (معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان) (خودا لێی ڕازی بێت) دەردەکەوێت، کاتێك پرسیاری لێکرا: کـام تیرەتـان شـکۆدارتر بـوون. ئێوە یان (بەنی هاشم؟) دەڵێت: ئێمە پیاوماقوڵی زۆرترمان هەبوون بـەڵام ئـەوان شـکۆدارتر بوون، ئەوان (عبدالمطلب)یان هەبوو ئێمـە کـەسمان تێـدا نـەبوو خـۆی لـە قـەرەی ئـەو بـدا، کاتێك ئێمە ژمارەمان زۆرتر بووو پیاوماقوڵمان زیاتر بوون، ئەوان کەسێکیان نەبوو شـان بـە شـانی کەسـی ئێمـە بوەسـتێتەوە، بـەڵام هێنـدەی چـاوترووکانێکی نەخایانـد ئـەوان وتیـان: پێغەمبەر لە ئێمەیە، پێغەمبەر هاتو نە پێشینانو نـە ئەوانـەی دوای ئـەوانیش دێـن وێنـەی ئەویان تێدا پەیدا نـەبووەو پەیـداش نابێـت، موحەممـەد (ﷺ) بـوو بـە پێغەمبـەر، کـێ ئـەو خێروبێرو شکۆدارییەی دەست دەکەوێت؟!.[3]

هـەموو ئەمـە ئـەوە ناگەیـەنێت کـە هـیچ کێبەرکێیـەك لـە نێـوان ئـەم دوو بەرەبابـەدا نەبووبێتو لە نێو کەشو هەوای سروشتی ژیانی عەرەبەکانی (مەککە)ی پێش ئیسلامدا هـیچ کێشەیەکیان نەبووبێت، هەرچەندە کێبەرکێو ناکۆکی لە نێوان براو ڕۆڵەکانی یـەك بابیـشدا

---

١ المصدر نفسه (ص:١٢٣).

٢ تاريخ إبن خلدون (٢/٣).

٣ البداية والنهاية (١٣٨/٨).

ڕوودەدات، بەڵام کێبەرکێی نێو ئەم دوو بەرەبابەیە هێندە پەرەی نەسەندووە تا سەنگەر لێك بگرن‌و شەڕی خۆبەخۆ بکەن، وەك زێدەڕۆیان ئەمە دەڵێن.[١]

ژمارەیەك بەڵگەی مێژوویی‌مان لەبەر دەستدان کە پەیوەندی بەهێزی نێوان (بەنی هاشم)و (بەنی ئومەییە) دەسەلمێنن، (عبدالمطلب ی کوڕی هاشم)ی سەرۆکی هاشمیەکان‌و (حەربی کوڕی ئومەییە)ی سەرۆکی ئومەویەکان هاوڕێی یەکتر بوون، بە هەمان جۆر (عەباسی کوڕی عبدالمطلب)و (ئەبو سوفیانی کوڕی حەربی کوڕی ئومەییە) هاوڕێ‌و دۆستی گیانی بە گیانی یەکتر بوون، بەسەرهاتەکەی موسوڵمانبوونی (ئەبو سوفیان) لە کاتی فەتحی (مەککە)داو ڕۆڵی دڵسۆزانەی (عباس) بۆ (ئەبوسوفیان) گەورەترین بەڵگەی ئەم ڕاستیەیە، لە لاپەڕەکانی دادێن (بە ئیزنی خودا) ئەمە ڕوون دەکەینەوە، ئەوەی نامۆو جێی سەرسوڕمانە (مقریزی) کتێبێکی تایبەت بە پەیوەندی نێوان هاشمیەکان‌و ئومەویەکان داناوەو تەوەری باسەکەی ناوناوە (النزاع والتخاصم= کێشمەکێشم و دوژمنایەتی)، لەگەڵ ئەمەشدا دان بە دۆستایەتی‌و پەیوەندی توندو تۆڵی نێوان (عەباس)و (ئەبو سوفیان)دا دێنێت،[٢] جا کاتێك پەیوەندی دۆستانەی توندو تۆڵ هەبووبێت لە نێوان سەرانی هەردووك بنەماڵەکە (ئومەوی‌و هاشمی)و هەردوو لاش بەرەی یەك باپیرە (عبد مناف ی کوڕی قصی) بووبن، ئەوا دروستکردنی قسەی هەڵبەست‌و پەڵیت‌و گومانـاوی لەسەر گێڕانەوەی ناکۆکی نێوانیان لە سەردەمی ئیسلامدا بۆ سەردەمی نەفامی هیچ پاڵپشتێکی مێژوویيان نیە.[٣]

ئەم کتێبەی کە بە ناوی (النزاع والتخاصم فیما بین بني أمیة وبني هاشم) دراوەتە پاڵ (المقریزي) ، هیچ مرۆڤێکی ژیر باوەڕ ناکات کە (مەقریزی) یەك پیتی ئەو کتێبەی نووسیبێت، چونکە ناگونجێت (مەقریزی) ئەوەندە دابەزیبێت‌و بەم شێوەیە ئەقڵی پەك خستبێت‌و بەرانبەر بە حوکمدانەکان بێ ئاگا بووبێت، دانەری ئەم کتێبەو خاوەنەکەی لە سەردەمی دەرکەوتنی هەست‌و سۆزی تیرەگەری دایناوەو خۆی لەو سیفەت‌و ڕەوشتانە داماڵیوە کە بۆ هەموو مێژوونووس‌و زانایەك پێویستن، ئەم کتێبەی کردووەتە هەناسەیەك بۆ توورەییەکی شاراوەو پەنگخواردوو، ئەم ڕقو توورە پەنگخواردووەشی کردووە بە بناغەی

---

١ الدولة الاموية المفترى عليها (ص:١٢٣).
٢ المعالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ٢).
٣ المصدر نفسه (ص: ٥).

حوکمدانەکانی‌و دروشمی کتێبەکەی.[١] دکتۆر (إبراهیم شعوط) ڕای وایە: ئەم کتێبە هی (مەقریزی) نیەو تەنها دراوەتە پاڵی.[٢]

ئەوەی جێی بایەخی ئێمەیە: ئەو حوکمدانەی لە لایەن خاوەنی کتێبەکەوە دراوە دەرهەق بە (هەبوونی دوژمنایەتیەکی دامەزراوی کۆن لە نێوان (بەنی هاشم)و (بەنی ئومەییە)دا، ئەوا ئەم پڕوپاگەندەیە لە بەرانبەر توێژینەوەی زانستیانەی خاوێندا خۆڕاناگرێت‌و ناسەلمێت، ئەوانەی لە گۆشەنیگای هەڵوێستی ئەبو سوفیان لە بەرانبەر ئیسلام لە (مەککە)داو ئەو جەنگانەی لە نێوان (عەلی)و (معاویە)دا (خودا لێیان ڕازی بێت) ڕوویانداوە دەڕواننە مێژووی (بەنی ئومەییە)و دەیانەوێت بنەمایەکی مێژوویی بۆ پەیدا بکەن، هەروەکو (عقّاد) ئەمەی کردووەو چەند هەواڵێکی ناڕاستی کردوونە بەڵگە بۆ ململانێیەکی مێژوویی لە نێوان هاشمیەکان‌و ئومەویەکان لە پێش ئیسلام‌و دوای ئیسلام، ئەم ڕیوایەتانە تارمایی‌و درۆو دەلەسەن‌و ناکرێن بە مێژوو، چونکە ڕیوایەتی بێ سەنەدو ڕووداوی نەخوازراو هەرگیز نابنە بەڵگە بۆ هەبوونی ململانێی ئاوا لە نێوان ئەم دوو بەرەبابە خانەدانەی (عبدمناف)، بەڵکو ئەم دوو لقە بەرزترین لقەکانی درەختی هۆزی (قورەیش) بوون،[٣] پاش فڕێدانی ئەم ڕیوایەتە نادروستانەو چیرۆکە ئەفسانەییانە، لێکۆڵینەوەی زانستیانەی خاوێن دەری دەخات کە: پەیوەندی نێوان ئەم دوو بەرەبابە وەك پەیوەندی نێوان تەواوی بەرەبابەکانی تری (قورەیش) ئاسایی بووە.

**دووەم: هەڵوێستی (بەنی ئومەییە) لە بەرانبەر (بانگەوازی ئیسلام)دا:**

تەواوی تیرەو تایەفەکانی (قورەیش)ی وەك (بەنی مەخزوم)و (بەنی هاشم)و غەیری ئەوانیش هەڵوێستیان چۆن بوو بەرانبەر بە بانگەشە تازەکە، (بەنی ئومەییە)ش هەمان هەڵوێستی هەبوو، با نموونەیەك بێنینەوە لەسەر چۆنیەتی هەڵسوکەوتی (بەنی هاشم)ی خزمە هەرە نزیکەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لە بەرانبەر بانگەشەکەدا: ئەقڵییەتە باوە دەمارگیریەکەی سەردەمی (جاهیلی) وای دەخواست خێراو بێ دواکەوتن بە باوەڕهێنان‌و پشتیوانی لێکردن ئامێزیان لەو بانگەشە تازە دابایە کە سەربەرزی‌و شکۆمەندی بۆ بەدەستهێنان، دەبوایە بە بەخشین‌و پشتگیری لە پشت ئەو پێغەمبەرە هاشمیە

١ أباطيل يجب أن تمحى من التاريخ (ص: ٢٠٩).

٢ المصدر نفسه (ص: ٢١٣).

٣ المناهج الاسلامية لدراسة التاريخ، د. محمد رشاد خليل (ص: ٢٤).

بوەستبانایە، هەرچەندە لە هەندێك هەڵوێستدا بە كردەوە لەگەڵیدا بوون كە هەرە دیارەكەیان لەو كاتەدا بوو كە كافرەكان ئابووریان خستە سەر خۆی‌و موسڵمانەكان لە شیوی (ئەبو تالیب)دا، بەڵام بە شێوەیەكی گشتی لە بەرانبەریدا دابەشبوون بۆ پشتیوان‌و بەرهەڵستكارو ئیماندارو كافر، هەڵوێستی ئەوانیش هەروەكو هەڵوێستی غەیری خۆیان بوو لە تیرەكانی تری (مەككە) لە بەرانبەریدا، نموونەی كافرە بەناوبانگەكانی (بەنی هاشم): (ئەبو لەهەب)ی مامی پێغەمبەر (ﷺ) بوو، كاتێك پێغەمبەر دەستی بە بانگەواز كرد (ئەبو لەهەب)یش یەكەمین كەس بوو دەستی بە دژایەتی كردنی ئیسلام كرد، ئەو هەموو فەندو فێڵێكی كرداری بە ڕاشكاوانە لە دژ بەكارهێنا، هەروەها شێوازو ڕێوشوێنی زۆرە بۆ ئازاردانی پێغەمبەر (ﷺ)و خەڵك لە دەورە تەكاندنەوەی گرتەبەر.[١] لەم دژایەتیكردنەدا (ئوم جەمیل)ی كچی (حەرب)ی ئومەوی هاوسەری‌و هەردوو كوڕەكەی (عوتبەو عوتەیبە)ی لەگەڵ بوون، ئەم دوانە -كە زاوای پێغەمبەر بوون- تا (محمد) بە گرفتی كچەكانیەوە خەریك بكەن هاتن (ڕوقیەو ئوم كلثوم)ی كچانی پێغەمبەریان تەڵاق دان.[٢] (عوتبە) هێندەی بەشداری ئازاردانی پێغەمبەر (ﷺ) كرد، تا كار بەوە گەیشت پێغەمبەر (ﷺ) دوعای لێ كردو لە یەكێك لە گەشتەكانیداو لە ڕێگا شێر تێكوپێكی شكاندو هەنجن هەنجنی كرد،[٣] بەڵكو لە كاتی گەمارۆی كافرەكاندا (ئەبو لەهەب) لەگەڵ تیرەكەی نەكەوت‌و نەچووە شیوی (بەنی هاشم)،[٤] كاتێكیش نەیتوانی لەگەڵ (قورەیش) دەربچێت بۆ (بەدر) تا جەنگ لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) بكات ،(عاصی كوڕی هوشامی كوڕی موغیرە)ی بە كرێی (٤) هەزار درهەم لە بری خۆی ناردە ئەوێ،[٥] لە ڕاستیدا (ئەبو لەهەب) لە كوفرو نكوڵیدا نموونەیەكی دیارو زەقە، بەڵام ئەو تاكە هاشمیەكی تەنها نەبوو كە ئیمانی بە پێغەمبەر (ﷺ) نەدەهێناو ئازاری دەداو جەنگی لەگەڵ دەكرد، لەنێو دیلە كافرەكانی جەنگی (بەدر)دا چەند هاشمیەكی وەكو (عەباسی كوڕی عبدالمطلب)و (عوقەیلی كوڕی ئەبو تالیب)و (نۆفلی كوڕی حاریس)و (عوتبەی كوڕی عەمروی كوڕی جەحدەم) دەبینران، خۆ پێغەمبەر (ﷺ) چۆن

---

١ السيرة النبوية لابن هشام (٢/٦٤ـ٦٥)، السيرة للصلابي (١/٤٠٤).

٢ السيرة النبوية لابن هشام (٢/٢١٩)، الدولة الاموية، شاهين (ص: ١٢٥).

٣ أنساب الأشراف (١/١٣٠ـ١٣١).

٤ السيرة النبوية لابن هشام (١/٣٣٩).

٥ السيرة النبوية لابن هشام (٢/١٨٢).

فیدیەی ئازادبوونی لە دیلەکانی (قورەیش) قبوڵ فەرموو، ئاوایش فیدیەی لەوان وەرگرت،[١] (ئەبو سوفیانی کوڕی حاریسی کوڕی عبدالمطلب)یش لەگەڵ بتپەرستەکاندا بەشداری جەنگی بەدری کرد، بەڵام لە کوژران‌و گیران ڕزگاری بوو[٢] ، ئەمە لە کاتێکدا ئەو ئامۆزای بابرای پێغەمبەر (ﷺ) بووو برای شیریشی بوو، ڕۆژگارێك (حەلیمەی سەعدیە) شیری پێدابوون، ئەو هاوڕێی پێغەمبەر (ﷺ) بووو زۆر هۆگری ببوو، بەڵام کاتێك خوای گەورە پەیامی خۆی بۆ ناردو کردی بە پێغەمبەر، ئەبو سوفیان لێی هەڵگەڕایەوەو ئەو دوژمنایەتیەی ئەو دەیکرد کەس نەیدەکرد، لەگەڵ تیرەی (بەنی هاشم) نەچووە نێو شیوەکەوەو هەجووی پێغەمبەرو هاوەڵانی دەکردو، بە ڕۆژی ڕوون ستەمی لە پێغەمبەر (ﷺ)و هەموو ئەوانە دەکرد کە پێش کۆچ باوەڕیان هێنابو[٣] .

بێگومان گەورەترین سەرخستن‌و پشتیوانی کە پێغەمبەر (ﷺ) لێی سوودمەند بوو لە لایەن (ئەبو تالیب)ی مامیەوە بوو، ئەو لەم پێناوەدا گوشارێکی گەورەی لە لایەن (قورەیش)ەوە لەسەر بوو، بەڵام تا دوا هەناسەو دوا چرکەکانی ژیانی‌و کاتی چاولێکنانی بەرانبەر بە (دین)ی باپیرانی وەفادار بوو، لەسەر ئاینی ڕیشچەرموانی ئەو کاتەی هۆزەکەی کۆچی دوایی کرد[٤] . (عەباسی کوڕی عبدالمطلب)ی مامی پێغەمبەر (ﷺ) تا دوایە لە مەککە مایەوە، بە نابەدڵی‌و تۆبزێلێکراوی بەشداری جەنگی (بەدر)ی کرد لە دژی پێغەمبەرو تێیدا بە دیل گیرا، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) بۆ فەتحی (مەککە) بەڕێکەوتبوو (عەباس) ئیسلامبوونی خۆی ڕاگەیاند بەڵام کۆچی نەکرد بۆ (مەدینە)،[٥] ژمارەیەك لە هاشمیەکان وەك (عەلی کوڕی ئەبو تالیب)و (حەمزەی کوڕی عبدالمطلب)و (جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب)و کەسانی تریش لەوانە، هەر لە (مەککە) ئیسلام بوون‌و لەڕێی بانگەوازدا هەوڵ‌و تێکۆشانێکی زۆریان پێشکەش کرد، بەڵام ئەمان لەم گۆڕەپانەدا هاوبەشی خەڵکانی غەیری خۆیان بوون لە تیرەکانی تر، وەکو: (ئەبو بەکرو عومەرو عوسمان) ئەوان لەبەر هاشمی بوونیان تێنەدەکۆشان ، بەڵکو لەبەر ئەوە موسڵمان بوون ئەوان جیا لەو کەسانەی بە دەم

---

١ تاريخ الطبري (٢/٤٦٥ـ٤٦٦).

٢ المصدر نفسه (٢/٤٦٢).

٣ في أختصار المغازي والسير، لابن عبدالبر (ص: ٤٤).

٤ زاد المعاد (٢/٤٦)، السيرة النبوية لابن هشام (١/٢٥٦).

٥ السيرة النبوية لابن هشام (٤/١٢).

بانگەوازی ئیسلامەوە چوون‌و چاوپۆشی لەوە دەکرێت سەر بە کام تیرەو تایەفەیەك بوون هەمیشە ئیمانەکەیان دەبێتە بەڵگەی ڕاست‌و دروستی قسەکانیان.[١]

سەبارەت بە (بەنی ئومەییە)و هەڵوێستیان لە بەرانبەر ئیسلامدا، مێژوونووسەکانمان وەکو تیرەیەکی سەربەخۆ قسە لەسەر ئەمان ناکەن ، بەڵکو لە چوارچێوەی (قورەیش)داو وەکو تەواوی تیرەکانی ترو ڕۆڵەکانی (عبدشمس)ی بابی (ئومەییە) باسیان لێوە دەکەن، ئەوان هەمووانیان بە یەکپارچە دادەنێن.[٢] بەڵکو هەر هەموویان بەرەی یەك باب بوون‌و پەیوەندی کۆمەڵایەتی‌و ژن‌و ژنخوازی بە یەکتری دەبەستنەوە، لەبەر ئەمە کاتێك ئەوان قسە لەسەر دوژمنایەتی (بەنی ئومەییە) دەکەن لە بەرانبەر پێغەمبەر (ﷺ)دا ناوی (عوتبەو عوتیبە)ی جوتە کوڕی (ڕەبیعەی کوڕی شەمس) دەهێنرێت، هەرچەندە ئەمانە لە تیرەی (بەنی ئومەییە) نین، ئەمجا لەگەڵ ئەماندا ناوی (ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب)و (عوقبەی کوڕی ئەبی موعیت) دەهێنن، هەرچی (عوقبەی کوڕی ئەبی موعیت) بوو لە کەسە شەڕەنگێزەکانی (قورەیش) بووو تفی لە دەموچاوی پێغەمبەر (ﷺ) کردو، لە کاتێکدا نوێژی دەکرد پزدانی وشتری بەسەردا داو پەتە پەڕۆیەکی کردە ملی پیرۆزی تا بخنکێت، بەڵام (ئەبوبەکری صدیق) پاڵی پێوەناو ڕەتاندی[٣] ، کاتێك لە ڕۆژی (بەدر)دا بە دیل گیرا ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی دا بیکوژن، بەمەتۆڵەی دنیایی لێ سەنرایەوە، ئەوەی غەریب بوو ئەمەبوو کە ئەو دەیوت: خزمایەتی‌و سیلەی ڕەحم بە یەکیانەوە دەبەستێتەوە[٤].

وێنەی ئەم نموونە سەرەڕۆیانەو سەرشێتانەی لە دژی پێغەمبەر (ﷺ) ئەنجام دەدران لە (مەککە)دا تەنها لە لایەن (بەنی ئومەییە)و (عەبد شمس) نەبوون،[٥] دژایەتی (عوتبەو شەیبە)ی جوتە کوڕی (ڕەبیعە) زانراوە، بەڵام لەگەڵ ئەم هەموو دوژمنایەتیەدا کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی کرد بۆ (طائف)و خەڵکەکەی بەرپەرچیان دایەوەو منداڵ‌و پاڵ بە دوای کەوتن‌و دەیانشێراندو بەردبارانیان دەکرد، لەو کاتەدا پەنای بۆ حەوشەی ڕەزی (عوتبەو شەیبە)ی کوڕانی (ڕەبیعە) برد، کە بەم حاڵە بینیان ڕەحمیان بزواو بانگی

---

١ الدولة الاموية المفترى عليها (ص:١٢٧).

٢ السيرة النبوية لابن هشام (٣/٧٠-٧١).

٣ البخاري، رقم (٣٦٨٧، ٣٨٥٦).

٤ السيرة النبوية لابن هشام (٢/٢١٢).

٥ الدولة الاموية المفترى عليها (ص:١٢٧).

(عداس)ی خزمەتکاریان کرد —کە نەسرانی بوو— و پێیان وت: هێشووە ترێیەك بخە نێو ئەم بەرچنەوەو برۆ بۆ لای ئەو پیاوەو پێی بڵێ لێی بخۆ[1].

**سێهەم: ئومەویە موسڵمانەکان لە سەرەتای بانگەوازی ئیسلامدا:**

ئەگەر سەبارەت بە قسەکردن لەسەر (بەنی ئومەییە)و (بەنی عەبد شمس) لە پێڕەوی مێژوونووسان لابدەین، ئەوا بێگومان کۆمەڵێكو لەو بەرەبابە دەبینین کە لە ڕیزی پێشەوەی ئەو کەسانەدا بوون بە پەلە ئیسلام بوون، هەر لە قۆناغی نهێنی بانگەوازداو پێش (هیجرەت) (عوسمانی کوڕی عەففانی کوڕی ابی العاصی کوڕی ئومەییە) موسڵمان بوو، ئەو لە ڕۆژانی یەکەمی ئیسلامدا لەسەر دەستی (ئەبو بەکری صدیق) موسڵمان بوو.[2] (خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاسی کوڕی ئومەییە)ش وەکو (عوسمان) موسڵمان بوو، هەر لە قۆناغی نهێنیدا (کە نزیکەی سێ ساڵی خایاند)،[3] (ئەبو حوزەیفەی کوڕی عوتبەی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی عەبد شمس) موسڵمان بوو.[4] بە هەمان شێوەو لە بەرەبەیانی بانگەوازدا دوو هاوپەیمانی (بەنی ئومەییە)، واتە (عبداللە ی کوڕی جەحشی کوڕی ڕیئاب)و (ئەبو ئەحمەدی کوڕی جەحش)ی برای کە پورزای پێغەمبەر (ﷺ) بوونو (ئەمیمەی کچی عبدالمطلب) دایکیان بوو هاتنە سەر ئایینی ئیسلام،[5] ئەمەو ژمارەیەك لە موسڵمانانی (بەنی ئومەییە) لە هیجرەتی یەکەمی هاوەڵاندا بۆ حەبەشە بەشدارییان کرد وەکو: (عوسمانی کوڕی عەففان)و هاوسەرەکەی واتە (ڕوقیەی کچی پێغەمبەر ـﷺـ) (ئەبو حوزەیفەی کوڕی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە) لەگەڵ (سەهلەی کچی سوهەیلی کوڕی عەمرو)ی هاوسەری.[6]

بە هەمان شێوە لە هیجرەتی دووەمیشدا بۆ (مەدینە)، (بەنی ئومەییە) بەشدارییەکی بەرچاویان هەبووەو ژمارەیەك لە هاوپەیمانەکانی خۆشیان لەگەڵ بوون، ئەمەو (دکتۆر حەمدی شاهین) ناوەکانیانی لە لیستەیەکی درێژدا تۆمار کردوون، کە جەخت لەسەر ئەوە دەکات ژمارەیەك لە (بەنی ئومەییە) هەر لە سەرەتای بانگەوازدا بە دەم ئیسلامەوە

١ السيرة النبوية (١/٢٩٢ـ٢٩٣).
٢ السيرة النبوية لابن هشام (١/٢٦٠).
٣ تاريخ الطبري (٢/٣١٨).
٤ السيرة النبوية لابن هشام (١/٢٦٣).
٥ المصدر نفسه (١/٢٦٢).
٦ المصدر نفسه (١/٣١٥).

هاتوون،[١] بە هەمان شێوە ژنانی (بەنی ئومەییە)و (عەبد شەمس) لە بەخشین‌و فیداکاریدا بوونە نموونەی پێشەنگایەتی‌و چاولێکردن لە بەرێخستنی کاروانی بانگەوازی ئیسلامدا، ئەمەو (ڕەملەی کچی شەیبەی کوڕی ڕەبیعە)ی هاوسەری (عوسمانی کوڕی عەففان) موسڵمان بووو کۆچی کرد بەرەو (مەدینە)، ئەمە لەگەڵ ئەوەدا باب‌و مام‌و کوڕە مامەکەی لە (بەدر)دا کوژران، بەڵام ئەو لەسەر دینە تازەکەی سەقامگیر بوو، (هیندی کچی عوتبە)ی (ئامۆزای) لە بەرانبەر ئەمەدا جامی ڕقی خۆی بەسەردا دەڕێژێت‌و بەم شێعرە هەجوی دەکات‌و لەکەداری دەکات:

لحى الرحمن صابئة بوج ومكة أو بأطراف الحجون

تدين لمعشر قتلوا أباها أقتل أبيك جاءك باليقين[٢]

هەروەها (ئوم كلثوم)ی کچی (عوقبەی کوڕی ئەبی موعیت) لە کاتی سوڵحی (حودەیبیە)ی نێوان پێغەمبەرو موشریکەکاندا کۆچی کرد بۆ شاری (مەدینە)، جوانترین وێنەو بەرزترین نموونەش موسڵمان بوونی دایکی ئیمانداران (ئومو حەبیبە ڕەملەی کچی ئەبی سوفیان)ە، ئەو هەر لە بەرەبەیانی هەڵاتنی پرشنگی بانگەوازدا موسڵمان بوو،[٣] بە هاوڕێیەتی شووەکەی بەرەو (حەبەشە) کۆچی کرد، بە ئیزنی خودا لەمەولا قسەی لەسەر دەکرێت.

### چوارەم: ژن‌و ژنخوازی نێوان بەنی هاشم‌و بەنی ئومەییە:

ئەو ڕقلێکتربوونەوەو دوژمنایەتی‌و ناکۆکیەی دوژمنانی ئیسلام‌و موسڵمانان بە هۆنینەوەو ڕێکخستنی چیرۆک‌و بەسەرهاتی ئەفسانەیی سەبارەت بە پەیوەندی نێوان (بەنی هاشم‌و بەنی ئومەییە) دەیبێژن، دوورە لە ڕاستیەوەو هەرگیز لە ئارادا نەبووە، حەقیقەتی مێژوویی دەڵێت: پەیوەندی نێوانیان پەیوەندی ئامۆزایانەو برازایانەو پورزایانەو خوارزایانەو خزمانە بووە، ئەوان لە هەموو کەس لێکتر نزیك بوون‌و ڕێزو خۆشەویستیان بۆ یەکتر دەنسواندو لە خەم‌و پەژارەو ژان‌و ئازارەکاندا بەشداری یەکتریان دەکرد، (بەنو ئومەییەو بەنو هاشم) هەموویان (بەر لە ئیسلام) بەرەی یەك باب‌و نەوەی یەك باپیرەو لقی یەك درەخت بوون‌و دوای (ئیسلام)یش لە یەك کانی‌و سەرچاوەی ڕوونەوە ئاویان دەخواردەوەو بەری ئەو دینە پاك‌و بێگەردەی خودایان دەچنی کە پێغەمبەری ڕاستگۆی دەست‌و دڵپاك‌و

---

١ الدولة الاموية المفترى عليها (ص:١٣١).

٢ نسب قريش (ص: ١٠٤_١٠٥).

٣ التبيين في أنساب القريشيين (ص: ٢٠٩).

مامۆستای پەروەردەکارو کۆتا پێغەمبەر پێی هات، لە ڕاستیدا نێوانی (ئەبو سوفیانو عەباس) هێند خۆشو دۆستانە بوو، کە بە نموونە دەهێنرێتەوە،[١] هەروەکو چۆن بەر لە ئیسلامو دوای ئیسلامیش ژنو ژنخوازیان لە نێواندا هەبووە، لە سەروی هەمووشیانەوە پێغەمبەری خودا (ﷺ)، ئەو (٣) کچی خۆی دا بە (٤) کوڕی (بەنی ئومەییە)، ئەمە چەند نموونەیەکن لەو ژنو ژنخوازیەی لە نێوانیاندا ئەنجام دراون:

أ- (عوسمانی کوڕی عەفانی کوڕی ئەبیلعاسی کوڕی ئومەییە)، هاوسەرگیری لەگەڵ (ڕوقیە)ی کچی پێغەمبەر (ﷺ) کردو پاش وەفاتی (ڕوقیە)، هاوسەرگیری لەگەڵ (ئوم کلثوم)ی کچی پێغەمبەر (ﷺ) کرد.

ب- (ئەبولعاسی کوڕی ڕەبیع)ی سەر بە (بەنی ئومەییە)، هاوسەرگیری لەگەڵ (زێنەبی کچی پێغەمبەر -ﷺ-) کردو لەو نێوانەدا کچێکیان بووە بەناوی (ئومامە)وە، (عەلی کوڕی ئەبوتالیب) (خودا لێی ڕازی بێت) دوای وەفاتی (فاطمة) (ئومامە)ی خواستو هاوسەرگیری لەگەڵ کرد.[٢]

ت- (خەدیجە)ی کچی (عەلی کوڕی ئەبوتالیب) بوو بە هاوسەری (عبدالرحمن)ی کوڕی عامری کوڕی کریزی ئومەوی.[٣]

ث- (ڕەملەی کچی عەلی کوڕی ئەبوتالیب)، بوو بە هاوسەری (معاویەی کوڕی مەروانی کوڕی حەکەم).[٤]

ج- (زێنەبی کچی حەسەنولموسەننای کوڕی حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبوتالیب)، بوو بە هاوسەری (وەلیدی کوڕی عبدالملك ی کوڕی مەروان).[٥]

ح- (فاطمەی کچی حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی ئەبوتالیب) بوو بە هاوسەری (عبدالله ی کوڕی عەمروی کوڕی عوسمانی کوڕی عەففان)،[٦] ئەمەو لێرە بە باسکردنی ئەمەندانە واز دەهێنم، کە بێگومان ئەمەندە بەسە بۆ کەسێك ڕاستی بوێتو بەرچاوی خۆی پێ ڕووناك بکات.[٧]

---

١ الشيعة وأهل البيت (ص: ١٤١).
٢ الأسماء والمصاهرات بين أهل البيت والصحابة، أبي معاذ السيد أحمد الاسماعيلي (ص: ٢٢).
٣ المصدر نفسه (ص: ٢٣).
٤ نسب قريش (ص: ٤٥)، جمهرة أنساب العرب (ص: ٨٧).
٥ نسب قريش (ص: ٥٢)، الأسماء والمصاهرات بين أهل البيت والصحابة (ص: ٢٥).
٦ الأسماء والمصاهرات بين أهل البيت والصحابة، (ص: ٢٥).
٧ الشيعة وأهل البيت (ص: ٢٢٤).

# فەسڵی یەکەم

# معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان ( خودا لێی ڕازی بێت ) تا کۆتایی سەردەمی خیلافەتی ڕاشیدە

## باسی یەکەم

## ناوو ڕەچەڵەكو نازناوو خێزانی

### یەکەم: ناوو ڕەچەڵەكو نازناوو لەدایکبوونی:

**ناووڕەچەڵەك**: (معاویە)ی کوڕی (ئەبی سوفیان) کوڕی (صخر) کوڕی (حەرب) کوڕی (ئومەییە) کوڕی (عەبد شمس) کوڕی (عەبد مناف) کوڕی (قوسەی) کوڕی (کیلاب).

**نازناو**: ئەمیری ئیمانداران‌و پاشای ئیسلام. (ئەبو عبدالرحمن)ی قوڕەیشی ئومەوی مەککی.[1]

**لەدایکبوونی**: (٥) ساڵ پێش پێغەمبەرایەتی لە دایك بووە، دەشوترێت (٧) ساڵ، یان (١٣) ساڵ، بەڵام یەکەمیان مەشهورترە.[2]

**شێوەی**: پیاوێکی بەژن بەرزو سپیو جوان‌و بەسام بوو، هێشتا منداڵ بوو باوكو دایكی پێشبینی ئایندەیەکی گەورەیان بۆ دەکرد، کاتێك گاگۆلکەی دەکردن (ئەبو سوفیان) ڕووبەڕووی دایکی (معاویە) دەیوت: ئەم کوڕەم کەللەسەری گەورەیە، شایستەی سەرۆکایەتی گەلەکەیەتی، هیند-ی دایکی معاویە- وەڵامی دەداتەوە: هەر گەلەکەی!، دەك سنگی بۆ بکوتم ئەگەر سەرۆکایەتی هەر هەموو عەرەب نەکات.[3] (ئەبانی کوڕی عوسمان) دەگێڕێتەوە: (معاویە) لەگەڵ (هیند)ی دایکی بەڕێگادا دەڕۆیشت، (معاویە) هەڵەنگوت، (هیند) پێی دەڵێت: دەك خودا ڕاستت نەکاتەوە!، هەستە دەی!، کەسێکی دەشتەکی ئامادەی ئەم دیمەنە دەبێتو دەڵێت: بۆچی وای پێ دەڵێی؟ سوێند بە خوا من پێم وایە لەمەولا سەرۆکایەتی هۆزەکەی دەکات، (هیند) دەڵێت: دەك خودا ڕاستی نەکاتەوە کە هەر تەنها سەرۆکایەتی هۆزەکەی بکات.[4]

---

١ سیر أعلام النبلاء (١٢٠/٣).

٢ الاصابة (١٥١/٦).

٣ البداية والنهاية (٣٩٨/١١).

٤ سير أعلام النبلاء (١٢١/٣).

## دووەم: موسڵمانبوونی (ئەبو سوفیان)ی باوکی (معاویە) (خودا لێیان ڕازی بێت):

(ئەبو سوفیان) یەکێك بوو لە ڕیزی کەسە سەرکەشو کەللەشەقەکانی جاهیلی کە دژایەتی (ئیسلام)یان دەکرد... کتێبەکانی ژیاننامەی پێغەمبەر (ﷺ) کرداره دوژمنکاریەکانی دەخەنەڕوو، بەڵام خودای بەرز ویستی هیدایەتی بدات، چەند ساتێك پێش فەتحی مەککە موسڵمان بوو، پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە کاتی فەتحی (مەککە)دا ڕێزی لێناو ڕایگەیاند: ((من دخل بيت أبي سفيان فهو آمن)).[١] واتە: هەر کەسێك بچێتە ماڵی ئەبو سوفیان ئەمان دراوە. لەم ڕێزلێنانەی ئەبو سوفیان لە لایەن پێغەمبەری نازدارەوە (ﷺ) خاڵێکی پەروەردەیی بەدی دەکەین دەبێ ئاوڕی لێ بدەینەوە، کاتێك ماڵەکەی ئەبو سوفیان تایبەت دەکاتو دەیکات بە پەناگا، ئەمە دەبێتە مایەی شکانی تینوێتی (ئەبو سوفیان)ـێك کە تا دوێنێ سەرگەورەی کافرەکانی (مەککە) بووەـ، دەبێتە هۆی سەقامگیربوونی زیاتری لەسەر ئیسلامو بەهێزتربوونی ئیمانیو[٢] داچۆڕانی هەرچی ڕقو تووڕەیی نێو دڵیەتی –کە تا دوێنێ لە بەرانبەر ئیسلامو موسڵماناندا هەیبووە– ، هەروەها پێغەمبەرمان (ﷺ) بەم هەڵوێستە جوانمەردانەی نیشانی دا کە ئەو جێگەو پێگەی تا دوێنێ ئەو لە نێو (قورەیش)دا هەیبووە، ئەوا لە ئیسلامدا تۆزقاڵێکی لێ کەم ناکرێتەوە بە مەرجێك لە بەرانبەریدا دڵسۆز بێتو لە پێناویدا تێبکۆشێتو ببەخشێت،[٣] ئەمە پەیڕەوێکی پیرۆزی پێغەمبەرایەتییە، پێویستە زانایانو بانگخوازان بیخەنە مێشكو دڵی خۆیانەوەو لە کاتی هەڵسوکەوت کردنیان لەگەڵ خەڵکدا کاری پێ بکەن.[٤]

ئەبو سوفیان ڕێکوپێکانەموسڵمان بوو، ئامادەی چەند جەنگێك بووو، خزمەتێکی زۆرو بەرچاوی پێشکەشی بە ئیسلام کرد، ئەو لە جەنگی (حونەین)دا لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ)دا بوو، ئامادەی گەمارۆدانی (طائف) بووو لەوێدا چاوێکی لە دەستدا، لە جەنگی (یەرموك)یش چاوەکەی تری لە دەستدا.[٥] پێغەمبەر (ﷺ) دوابەدوای سەرکەوتنی بەسەر(ثقیف)دا معاویەی لەگەڵ (موغیرەی کوڕی شوعبە) نارد تا (لات)ی بتی (سەقیف) بڕوخێنێت،[٦] (لات)

---

١ البخاري، رقم (٤٢٨٠).

٢ المستفاد من قصص القرآن (٤٠٣/٢).

٣ قراءة سياسية للسيرة النبوية محمد رواس (ص: ٢٤٥).

٤ السيرة النبوية للصلابي (٤٩٧/٢).

٥ التبيين في أنساب القريشيين (ص: ٢٠٣).

٦ السيرة النبوية لإبن هشام (١٩٥/٤).

بە لای (قورەیش)یشەوە گەورە بووو سوێندیان پێ دەخوارد، ئەمە ــ واتە ڕوخاندنی بتی (لات)ــ بەڵگەیە بۆ ئەبو سوفیان (خودا لێی ڕازی بێت) كە بە تەواوەتی ئیمانی لە دڵو دەروونیدا جێگیر بووە، لە ڕاستیدا ئەبو سوفیان كاتێك موسڵمان بوو كە سووربوونی لەسەر كەڵكەكەی سەرۆكایەتیو سەرۆكایەتی كردن ببووە ئاستەنگ لە نێوان خۆیو موسڵمان بوونیدا، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) چاودێری ئەو كارتێكەرە كاریگەرانەی سەر دڵو دەروونی (ئەبو سوفیان)و دڵو دەروونی تەواوی سەرگەورەكانی قورەیشی دەكرد لە كاتی فەتحی (مەككە)دا، وای كرد هەر كەسێك بچێتەماڵی (ئەبو سوفیان)ەوە چەپاڵە دەدرێت، هەروەكو لە دەستكەوتەكانی جەنگی (حونەین)ی بەخشی بە ئەوو تەواوی ئەوانەی وەكو ئەو لەو كاتەدا ناویان لێنرا (مؤلفة القلوب)[١].

ئەبو سوفیان دوژمنكاریەكانی ڕۆژگاری (جاهیلی) خۆی لە دژی ئیسلام لەبیر نەكردن، بەڵكو داكۆكی دەكرد تا تێكۆشانەكانی خۆی بۆ خزمەتی ئیسلام دووچەندانە بكات، (ابن كثیر) دەربارەی دەڵێت: ئەو لە سەردەمی جاهیلیدا لە گەورەكانی قورەیش بوو، لە ڕۆژی جەنگی (بەدر)دا وەك تاكە سەرۆك لە نێوانیاندا مایەوە، ئەمجا كاتێك موسڵمان بوو، ئیسلامی بە ڕێكوپێكی وەرگرت، چەندین هەڵوێستی شكۆدارانەو شوێنەواری ستایشلێكراوانەی لە جەنگی (یەرموك)و پێشو پاش ئەم جەنگەی تۆمار كردن.[٢]

(سەعیدی كوڕی موسەیب) لە باوكیەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: لە جەنگی (یەرموك)دا جگە لە دەنگی پیاوێك دەنگی كەس نەماو ئەو دەیوت: (ئەی سەركەوتنی خودا نزیك بەرەوە، موسڵمانەكان لەگەڵ ڕۆمەكاندا لە گەرمەی جەنگدا بوون، بەرەو دەنگەكە ڕۆیشتمو تەماشام كرد ئەوە (ئەبو سوفیان)ەو لە ژێر ئاڵای (یەزید)ی كوڕی دایە،[٣] هەروەها گێڕدراوەتەوە كە ئەو لە ڕۆژی جەنگی (یەرموك)دا بەسەر هێزی سوارەدا دە گەڕاو بە دەنگی بەرز دەیوت: ألله، ألله، ئێوە پاسەوانانی (عەرەب)و پشتیوانانی (ئیسلام)ن، ئەوانیش پاسەوانانی (ڕۆم)و پشتیوانانی (شیرك)ن، ئەی خودایە! ئەم ڕۆژە یەكێكە لە ڕۆژەكانت، خودایە سەركەوتن بۆ بەندەكانت بنێرە،[٤] وتراوە: ساڵێ (٣١) یان (٣٢) یان (٣٣) یان

---

١ الدولة الأموية المفترى عليها (ص: ١٤٢).

٢ البداية والنهاية (١١/٣٩٧).

٣ التبيين في أنساب القريشيين (ص: ٢٠٣).

٤ المصدر نفسه (٢٠٣).

(٣٤)ی کۆچی کۆچی دوایی کردووە، [1] معاویەی کوڕی نوێژی لەسەر کرد، وتراویشە: (عوسمان) نوێژی لەسەر کرد، کە مرد تەمەنی (٨٣) ساڵ بوو، دەشوترێت (٩٠)و چەند ساڵێك بوو [2].

## سێهەم: ( هیندی کچی عوتبەی کوڕی رەبیعە ) ی دایکی ( معاویە ) ( خودا لێیان رازی بێت ):

(هیند)ی دایکی معاویە، رۆژی فەتحی مەککەو دوابەدوای موسڵمانبوونی (ئەبو سوفیان)ی هاوسەری موسڵمان بووو لەسەر هاوسەرێتی یەکتر بەردەوام بوون، کە پێغەمبەر (ﷺ) لەو رۆژەدا لە وەرگرتنی بەیعەتی پیاوەکان-ی مەککە-بۆوە، ئەمجا بەیعەتی لە ژنەکانیان وەرگرت، (هیندی کچی عوتبە)یش لە نێوانیاندا بوو، بە حوکمی ئەو تاوانەی دەرهەق بە (حەمزە) لە جەنگی (ئوحود)دا ئەنجامی دابوو، دەترسا پێغەمبەر (ﷺ) بیناسێتەوە، بۆیە خۆی نەناس دەکرد، پێغەمبەر (ﷺ) بەیعەتی لێ وەرگرتن لەسەرئەوە: هاوبەش بۆ خودا پەیدا نەکەنو دزی نەکەنو زینا نەکەنو رۆڵەکانیان نەکوژنو نیسبەتی منداڵی هەڵگیراوە نەخەنە پاڵ شووەکانیانو سەرپێچی فەرمانی چاکە نەکەن، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ولا یسرقن) دزی نەکەن، (هیند) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ئەبو سوفیان پیاوێکی چروکە بەشی پێویستی بە خۆمو رۆڵەکانم نادات، جا ئەگەر بەبێ زانیاری ئەو لە ماڵەکەی هەڵبگرم گوناهبار دەبم؟، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: ((خذي من ماله ما یکفیك وبنیك بالمعروف)) واتە: بەشی پێداویستی خۆتو رۆڵەکانت بە لەباری لە ماڵەکەی دەربێنە، کاتێکیش فەرمووی: (ولا یزنین) زینا نەکەن!، دیسان (هیند) وتی: ئایا ژنی ئازاد زینا دەکات؟، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) هیندی ناسیەوە پێی فەرموو: ((وإنك لهند بنت عتبة؟)) ئەوە تۆ هیندی کچی عوتبەی؟، هیند وتی: بەڵێ، لە رابردوو ببوورە خوا لێت ببوورێت، ئەمەو ژنەکان بەبێ تۆقە بەیعەتیان بە پێغەمبەردا (ﷺ)، ئەو قەت تۆقەی لەگەڵ ژنان نەدەکرد، دەستی لە دەستی هیچ ژنێك نەداوە جگە لە دەستی ئەو ژنانەی خودا بۆی حەڵاڵ کردبوون، یان مەحرەمی بوون، لە دوو کتێبە (صحیح)ەکە (بوخاریو موسلیم)دا هاتووە: لە

---

١ المصدر نفسه (٢٠٣).

٢ المصدر نفسه (٢٠٣).

(عائیشه)وه (خودا لێی ڕازی بێت) وتی: نا، وەڵلاهی: قەت پێغەمبەری خـودا (ﷺ) دەسـتی بە دەستی هیچ ژنێك نەكەوتووە.[١]

(ابن سعد) له (عبدالله ی کوڕی زوبێر)ەوە دەگێڕێتەوە: کاتێـك (هینـد) بەیعـەتی دا وتـی: ئەی پێغەمبەری خودا، سوپاس بۆ ئەو خودایەی سەرکەوتنی بە نسیب ئەو دینە کرد کـە بـۆ خۆی هەڵیبژارد، ئەی موحەممەد با خزماتیەکەت سوودم پێ بگەیەنێت، من ژنێکم باوەڕم بە خودا هەیە، باوەڕم بە پێغەمبەرەکەی هەیە، ئەمجا پەچەکەی لەسەر دەم‌و چاوی لاداو وتی: من (هیندی کچی عوتبـە)م، پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: (مرحبـاً بـك) مەرحـەبات لێ بێـت!، هیند وتی: وەڵاهی ئەوەندەی پێم خۆشبوو بنەماڵەی تۆ تووشی دامـاوی‌و زەبـوونی بـێ لـەم سەر زەوییەدا بـۆ هـیچ بنەماڵەیـەکی تـرم هێنـدە پـێ خـۆش نـەبوو، بـەڵام ئـەمڕۆ لـەم سـەر زەمینەدا سەربەرزبوون‌و شکۆداربوونی هیچ بنەماڵەیەکم بە قەد شکۆداربوونی بنەماڵەی تـۆم بە لاوە خۆش نیە، پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: ((وأيضـاً والـذي نفـسي بيـده)) سـوێند بـەو کەسەی گیانی منی بە دەستە (ئەگەر ئاوا لەسەر ئیسلام‌و ئیمان بمێنیتەوە) زیاتریـشت پـێ خۆش دەبێت، هیند وتی: ئەی پێغەمبەری خودا: (ئەبو سوفیان) پیاوێکی دەسـت قوچـاوە، ئایا گوناهم دەگاتێ ئەگەر لەو ماڵەی هەیەتی دەرخـواردی خێزانەکـەی خـۆی‌و خـۆم بـدەم؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (لا أراه إلا بالمعروف)) ڕام نیە ئەم کـارەت چـاك بێـت، تـەنها بـە چـاکە نـەبێت.[٢] کاتێـك (هینـد) موسـڵمان بـووو بەیعـەتی دا، بـەرەو مـاڵ گەڕایـەوە، بتـە تایبەتەکەی خۆی بە تەشوێ پارچەپارچـە کـردو دەیـوت: مـن بـە تـۆوە سـەرکەش ببـووم‌و تەفرەم خواردبوو.[٣] کاتێك موسڵمانەکانی له (بيت الله الحرام) بینـین وتـی: بـە خـوا بـەر لـەم شـەو نـەمبینیوە خـودا بپەرسـترێت بـەو شـێوەی شایـستەیە لـەو مزگەوتـەدا، وەڵلاهـی موسڵمانەکان ئەمشەویان بە نوێژ بەڕێکرد، یان بە پێوە بوون، یان له ڕکوعدا بوون، یـان لـە سوژدەدا بوون.[٤]

(هینـد) لـە سـەردەمی نەفامیـدا هەڵوێـستێکی جـوانی لەبەرانبـەر (زێنـەبی کـچی محمـد المصطفى) نواندبوو، (زێنەب) له لای (أبي العاص ی کـوڕی ڕەبیـع)ی هاوسـەری دەبێـت لـە (مەککە)، پێغەمبەر (ﷺ) کەسێك بە دوایدا دەنێرێت بۆ مەدینـەی بێنێـت، ئەمـە دوابـەدوای

---

١ البخاري، رقم (٥٢٨٨)، مسلم، رقم (١٨٦٦).
٢ الطبقات الكبرى (١٧٢/٨)، البخاري، رقم (٣٨٢٥).
٣ الطبقات (١٧٢/٨).
٤ نحو رؤية جديدة للتاريخ (ص: ٢٠٠).

جەنگی (بەدر) دەبێت‌و هێشتا خوێنە ڕژاوەکەی (قورەیش) وشك نەبۆوە، (هیند) بە لەدەستدانی باوك‌و براو مامی جەرگی برابوو پشتی شکابوو، بەسەر کۆڕو کۆبوونەوەکانی (قورەیش)دا دەسوڕایەوەو بڵێسەی ئاگری تۆڵەی لە دڵ‌و دەروونیدا هەڵدەکردن‌و چەخماخەی گڕی جەنگی لێدەدا، ڕۆژێك لە ڕێگادا تووشی (زەینەبی کچی پێغەمبەر (ﷺ)) دەبێت، هەواڵی ڕۆیشتنی بۆ لای باوکی بەنێو خەڵکدا بڵاو ببۆوە، هیند پێی دەڵێت: ئەی کیژی محمد هەواڵم پێدراوە دەتەوێ خۆ بگەیەنیتە باوکت! !... ئەی ئامۆزایەکەم: بۆ ئەم سەفەرەت ئەگەر پێویستیت بە کەلوپەلێکە یان بە پارەیەکە تا پێی بگەیتە لای باوکت، ئەوا من بۆت جێبەجێ دەکەم‌و شەرمم لێ مەکە، ئەو (ڕق‌و تۆڵە)ی دەکەوێتە نێوان پیاوانەوە ناکەوێتە نێوان ژنانەوە، (زێنەب) (خوا لێی ڕازی بێت) بۆ خۆی ئەمە باس دەکات، دەڵێت: وەڵاهی پێم وابوو ئەوەی دەیوت بە نیاز بوو جێبەجێی بکات.[1] ئەمجا ئەو ڕۆژەی تێیدا دەردەچێت ژمارەیەك قورەیشی ڕێی پێ دەگرن‌و دەیانەوێ بیگێڕنەوە، زێنەب کە باردار دەبێت لە وڵاخەکەی بەردەبێتەوەو تووشی خوێنبەربوون (نزیف) دەبێت، هیند ئەمە دەبیستێت، بە پەلە دەردەچێت، یەك بەخۆ بەسەر تیرەکەی خۆیدا دەقیژێنێت‌و دەڵێت: جەنگ لەگەڵ مێینەی دابڕاو دەکەن؟! ئازایەتی‌و غیرەتەکەتان لە ڕۆژی (بەدر) لە کوێ بوو؟ ئەمەو لە (زێنەب)یان دوور دەخاتەوەو ئەمجا لە باوەشی دەگرێت‌و خوێنەکەی بۆ دەسڕێت‌و پاکی دەکاتەوەو کاروباری بۆ ڕێك دەخاتەوەو ئەمجا بەوپەڕی هێمنی‌و بێ ترس‌و بیم بەرەو لای باوکی‌و شاری (مەدینە) بەڕێ کەوت.[2]

هیند ژنێکی بیرتیژو هەستیارو خاوەن نەفسێکی بەرز بوو، ڕیوایەت کراوە: کە (هیند) بەر لە (ئەبو سوفیان) لای (فاکیهی کوڕی موغیرە) دەبێت، (فاکیە) یەکێك دەبێت لە گەنجانی قورەیش‌و دیوەخانێکی تایبەتی دەبێت بۆ هاوڕێکانی، ئەوان بەبێ پرس دەهاتنە لای، ڕۆژێك هیند دەچێتە لای (فاکیە) لە دیوەخانەکەیداو کەسی لێ نابێت‌و خەو دەیباتەوە، هاوڕێیەکی (فاکیە) دەچێتە ژوورەکەوەو تەماشا دەکات (هیند) نووستووە، ئەویش دێتە دەرەوەو (فاکیە)یش چاوی لێ دەبێت، دەچێتە ژوورەوەو دەبینێت (هیند) لەوێ نوستووە، ئیدی بوختان بە (هیند) دەکات کە ئەو پیاوە بۆ ئەو هاتووە. نێوانیان ئاڵۆز بوو کار بەوە گەیشت ڕێکەوتن بچنە لای (کاهین)ێك‌و دادوەریان لە نێواندا بکات، (عوتبە)ی باوکی سواری

---

[1] نحو رؤية جديدة للتاريخ (ص: ٢٠٨)، فرسان من عصر النبوة (ص: ٨٥٣).

[2] المصدر نفسه (٢٠٨).

ولاخێکی کردو فاکیهیش لەگەڵیان چوو، ڕۆیشتن تا خەریك بوو بگەنە ماڵی (کاهین)ەکە، باوکی تەماشای هیندی کرد بینی ڕەنگی زەرد بووەو هەڵبزڕکاوە، ئەویش جیای کردەوەو پێی وت: ئەی کیژەکەم: بۆ دەتبینم ڕەنگت زەرد بووەو تێکچوی؟ ، ئەگەر تووشی تاوانێك بووی، ئەوا پێش ئەوە لەبەرچاوی خەڵك ئابرومان بچێت بە من بڵێ، تا کارێك بکەم خۆمان دەرباز بکەین، (هیند) دەڵێت: با بە من پاکم، بەڵام من وا دەزانم دەچینە لای کەسێك جاری وا هەیە ڕاستی دەپێکێتو جاری واش هەیە نایپێکێت، جا دەترسم نەیپێکێتو قسەیەکم پێوە بکات، تا دنیا بە دنیایە ببێتە نەنگێكو لێمان نەبێتەوە، (عوتبە) دەڵێت: من تاقی دەکەمەوە، جا دەنکە گەنمێکی بۆ خستە نێو کیفێکەوەو سەرەکەی بەست، کاتێك گەیشتنە لای (کاهین)ەکە، (عوتبە) وتی: شتێکم شاردۆتەوە، دەزانی چیە؟ ، وتی: دەنکە دانەوێڵەیەکە لەنێو کەمەرەیەکدایە، وتی: ڕوونی بکەوە، وتی: دەنکە گەنمێکە لەنێو کیفێکدایە، هیندیان لەنێو ژناندا دانیشاندو ئەمجا پرسیاریان لە (کاهین) کرد، (کاهین) هەستایە سەرپێو هەردووك لەپە دەستی لەنێوشانی هیند ڕاکێشانو وتی: هەستە، ژنێکی خۆپارێزەو زیناکەر نیە، مەلیکێکی لێ دەبێت بە ناوی (معاویە)، جا (فاکیە) خۆی بە لای هەڵداو دەستی گرتو وتی: ئەی ژنەکەم، ئەویش دەستی ڕاپڕچکاندو وتی: سوێند بە خوا، دەبێت ئەو مەلیکە لە غەیری تۆ بێت، ئەمەو (ئەبو سوفیان) خواستیو (معاویە)ی لێ بوو،[1] ئیدی لە سەردەمی خیلافەتی (عومەری کوڕی خەتاب) (خودا لێی ڕازی بێت) کۆچی دوایی کرد.[2]

## چوارەم: ژمارەیەك خوشكو برای (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت):

١ـ یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان: بە حوکمی ئەوە لە هەموو کوڕەکانی (ئەبو سوفیان) باشتر بوو، (یزید الخیر= یەزیدی باش)ی پێ دەوترا، ڕۆژی فەتحی (مەککە) موسڵمان بوو، بەشداری جەنگی (حونەین)ی کرد، پێغەمبەر (ﷺ) سەد (١٠٠) وشترو (٤٠) ئۆقیە (زێڕ)ی لە دەستکەوتەکانی ئەو جەنگەی پێ بەخشی،[3] (ئەبو بەکر) کردی بە سەرکردەی یەکەمین سوپا کە بە مەبەستی فەتحی (دیمەشق)و بە هاوارەوەچوونی سوپا ئیسلامیەکانی تر لە کاتی پێویستدا بەرەو (شام)ی بەڕێکرد، سوپاکەی (یەزید) لە سەرەتادا لە (٣) هەزار

١ التبيين في أنساب القريشيين، (ص: ٢١٩).

٢ المصدر نفسه (ص: ٢١٩).

٣ التبيين في أنساب القريشيين، (ص: ٢٠٤).

جەنگاوەر پێکهاتبوو، بەر لەوە سوپاکە بەڕێ بکەوێت، (ئەبو بەکر) وەسیەتێکی کاکڵەدارو بەرزو بڵندو پەند ئامێزی سەبارەت بە جەنگو ئاشتی پێشکەش بە (یەزید) کرد، (ئەبو بەکر) بە پێیان پێشی کەوتبوو بەم شێوەیە وەسیەتی دەدا: من بە مەبەستی ڕاهاتن‌و ئەزمون وەرگرتن کردوومی بە سەرکردەی سوپاکە، ئەگەر چاکبووی‌و دەرچووی لەسەر پۆستەکەت دەتهێڵمەوەو پلەت بەرزتر دەکەمەوە، ئەگەر خراپ بووی‌و دەرنەچووی لێت دەخەم، پارێزگاری خودا بکە، خودا دەرو دەروونت وەك یەك دەبینێت، شایانترین کەس بە لای خوداوە کەسێکە زۆر دۆستایەتی خودا بکات، نزیکترین کەسیش بە لایەوە ئەو کەسەیە بە کردارەکانی لێی نزیك دەبێتەوە، ئەوە پۆستەکەی (خالید)م دایتێ.[1] خۆت لە دەمارگیری جاهیلی دوور بخەوە، چونکە خودا ڕقی لێیەتی‌و ڕقی لە خاوەنەکانیشی دەبێتەوە، کە لەگەڵ سەربازانت ڕۆیشتی با خوڵق‌و خۆو سەرو ڕووت لەگەڵیان خۆش بێت‌و بە چاکەو خێر دەستی خۆتیان ڕەپێشکەو مژدەیان پێ بدە، ئەگەر وتارت بۆ دان‌و ئامۆژگاریت کردن: بە کورت‌و گوشراوی تەواوی بکە، چونکە قسەی زۆر هەندێکی لەبیر دەباتەوە، خۆت چاك بکەو خەڵکت بۆ چاك دەبێت، نوێژەکان لە کاتی خۆیانداو بە تێرو تەواوکردنی ڕکوعەکانیان‌و سوژدەکانیان‌و گەردنکەچی تێیاندا ئەنجام بدە، ئەگەر نێردراوانی دوژمن هاتنە لات، ڕێزیان بگرەو با کەم لە لات بمێننەوەو خێرا سوپاکەت بەجێ بێڵن‌و لە نهێنیەکانی نەزانن، نەکەی بەنێو سەربازگەو سوپادا بیانگێڕی، نەبادا کەموکوڕیەکانت ببینن‌و زانیاریتان لەسەر کۆ بکەنەوە، لەنێو ئاپۆڕای سوپادا میوانداریان بکە،خۆت سەرپەرشتی وتووێژەکان بکەو نەیەڵی کەسی تر قسەیان لەگەڵ بکات، نهێنیەکانت‌و شتە دیارەکانت لێك جودا بکەوە با کارەکانت لێ تێکەڵ‌و پێکەڵ نەبن، ئەگەر ڕاوێژت بە کەسێك کرد قسەکانی بەڕاستی پێ بڵێ، ڕاوێژەکە ڕاست دەردەچێت‌و، تا بەسەر خۆتدا نەشکێیتەوە، هەواڵت لە ڕاوێژکارت تەنهان مەکە. شەوانە بەسەر هاوەڵانتدا بگەڕێ‌و قسەیان لەگەڵ بکە، هەواڵت بۆ دێن‌و پەردەی سەربازەکانت هەڵدەدرێتەوە، پاسەوانەکانت زۆر بکە، بە نێو سوپاکەتدا بڵاویان بکەوە کتوپڕو لە نەخافڵ بەسەریان بکەوە، کە پاسەوانێکت بینی بێ ئاگا بووە ئەدەبێکی جوانی دابدەو بەبێ زیادەڕۆیی سزای بدە، شەوانە سەرەیان بۆ دانێ، با سەرەی یەکەمی شەو لە دووەمەکەی درێژخایەنتر بێت، چونکە بە حوکمی

[1] واتە: (خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص) داوای لە (أبوبكر) کرد لە پۆستەکەی دابەزێنێت، ئەویش دابەزاند.

نزیکبوونی ئێوارە ئاسانترە، لە سزادانی موستەحەق سڵ مەکەوەو سزای لەسەر سوك مەکەو لەسەریشی گران مەکەو وای لیّ مەکە ترۆ ببێت، هێندە لە سەربازەکانت بیّ ئاگا مەبە بەمە خراپیان بکەیو، هێندەش بەسەریاندا مەیەو مەچۆو، جاسوسیان بەسەرەوە مەکە تا کار بەوە دەگا عەیبو عاریان بەدەر بخەی، هەرگیز پەردەی سەر نهێنی خەڵك هەڵ مەدەوە، هەوڵ بدە شتە ئاشکراکانیان بزانیو لەگەڵ گاڵتەچیەکانیان دامەنیشە، بەڵکو لەگەڵ خەڵکانی ڕاستگۆو وەفادار دانیشەو لەسەر ڕاستی ڕووبەڕووی خەڵك ببەوەو ترسنۆك نەبی، دەنا خەڵکیش ترسنۆك دەبن، خۆت لە دزیو پاشقولدانی ماڵ بپارێزە چونکە ئەمە لە هەژاریت نزیك دەکاتەوەو سەرکەوتنیش بەلا دەنێت، تووشی خەڵکانێك دەبن لەنێو پەرستگاکاندانو خۆیان لەوێدا بەند کردووە، لە خۆیانو ئەو کارانەشیان گەڕێن کە خۆیان بۆ تەرخان کردووە)).

(إبن الأثير) دەڵێت: ئەم وەسێتە لەڕووی سوودی زۆریەوە جوانترینو لەبارترین وەسێتە بۆ کاربەدەستان[١]. لە سوودەکانی:

- پۆستەکان مافی یەکجاری خاوەنەکانیان نین، بەڵکو ئەمە بەندە بە ئەندازەی چاکەو سەرکەوتن لە کرداردا، ئەگەر خراپ دەرچوون پێویستە لەسەر بەرپرسی باڵا لێیان بخات، ئەم هەستە هانی خاوەن پۆست دەدا هەوڵو تێکۆشانەکانیو پێشکەشکردنیو تواناکانی بە خاتری سەرکەوتن بۆ بەرزترین ئاستی سەرکەوتن دووچەندانە بکاتەوە، بەڵام ئەگەر زانی مانەوەی لەسەر پۆستەکەی مسۆگەرە لابەلای تەنبەڵیو خۆخەریککردن بە لەزەتەکانی دونیادا دەکاتەوە، بەمە دەگە لە پۆستەکەی دەداتو خەڵکانی ژێردەستەی تووشی جۆرەها گەندەڵیو ئاڵۆزیو کێشە دەکات.

- پارێزکردن لە خودای بەرزو بڵند، گرنگترین هۆکاری سەرکەوتنە لە کاردا، چونکە خودا ئاگاداری تەواوی کردارە ئاشکراکانی خەڵكو ناخیانە، ئەگەر لە دڵو دەروونیاندا پارێزی لیّ بکەن ئەوا زۆر شایانترە بۆیان لە کردارە دیارەکانیان پارێزی لیّ بکەن، بەمە کاربەدەست لە هەموو دیاردەکانی خراپەو خراپەکردن دوور دەکەوێتەوە، کە عادەتەن بە هۆی گوێڕایەڵی کردنی نەفسی چەموشو سەرکەشو پابەند نەبوون بە تەقوای خوداوە دێنە ئاراوە.

- ئاگاداربوون لە دەمارگیریو شانازیکردن بە بابو باپیرانو نەتەوەوە، ئەم دەمارگیریە مرۆڤ لە ڕاستە شەقام لادەدات، بە تایبەتی ئەگەر ئەم بابو باپیرو نەتەوانە پێچەوانەی

---

١ الكامل لإبن الأثير (٢/٦٤ـ٦٥).

ڕاستە شەقام بن، زیاد لەمەش وا لەو کەسە دەکات دەماری سۆزو خۆشەویستی ئیسلامیانەی لە بەرانبەر موسڵماناندا وشك ببێ.

ـ کورت هەڵێنانی وتار: چونکە قسەی زۆر هەندێکیان لەبیر دەبەنەوەو مەبەست لە دەست دەدات و گوێگر وادار دەکات سەری بە ڕەوانبێژی و وتاربێژی بسوڕمێ (ئەگەر ڕەوانبێژ بێت)و دەبێتە ڕێگر لەبەر دەم وەرگرتنی سود لە ئامۆژگاریەکانی، ئەگەر ڕەوانبێژیش نەبێت بیسەر بێتاقەت و وەڕز دەبێت و لە قسەکانی وتاربێژ تێ ناگات.

ـ ئەگەر کاربەدەست (بەرپرسیار) چاوی بە نەنگیەکانی خۆیدا گێڕاو خۆی چاك کردو خۆی کردە نموونەیەکی قەشەنگ بۆ پێشەنگایەتی، ئەوە دەبێتە مایەی چاکبوونی ژێردەستەکانیشی.

ـ بایەخدان بە بەرپاکردنی نوێژ بە تێرو تەواوی و ڕێکوپێکی: واتە تەواوکردنی وتەکان و کردارەکان لە ڕواڵەتداو لە ناخیشدا، واتە: نواندنی گەردنکەچی و ئامادەبوونی دڵ و هۆش لە بەرانبەر خودادا، ئەم جۆرە نوێژە تێرو تەواوە یادی خودای پێ لەسەر زەویدا بەرپا دەبێت و ڕەوشتەکانی پێ پاك و پوخت دەبن و دڵەکانی پێ بەهێز دەبن و دەبێتە مایەی ئاسودەبوونی دەروونەکان، بەڵێ نوێژکردن ئەو قەڵا دامەزراوەیە موسڵمان لە کاتی نارەحەتیەکاندا پەنای بۆ دەبات.

ـ ڕێزلێنان لە نێردراوانی دوژمن کاتێك هاتن، لەگەڵ خۆپارێزی لێیان و بوارنەدانیان بە بەئاگابوونیان لەسەر واقیعی سوپای ئیسلامی، بەڵێ ڕێزلێنانیان جۆرێکە لە بانگەشەکردن بۆ ئیسلام تا بزانن کە موسڵمانان چۆن بە ڕەوشتە بەرزەکان ڕازاونەوە، بەڵام نابێت ئەم ڕێزلێنانە بگاتە ئاستێ: ئاگاداری نهێنی کاروباری موسڵمانان بن، بەڵکو پێویستە هێزو پێزی سوپای ئیسلامیان نیشان بدرێت،تا کە گەڕانەوە لای گەلەکەیان باسی بکەن و بەمە سام و هەیبەتیان لێ بنیشێت[١].

ـ پاراستنی نهێنیەکان و بە سوك تەماشا نەکردنیان لە بڵاوکردنەوەیاندا، بە تایبەتی ئەو نهێنیانەی پەیوەستن بە کاروباری گشتی موسڵمانانەوە، مرۆڤی دانا توانای بەسەر ناسینی کاروبارەکاندا دەشکێت هەرچەندە زۆرو جۆراوجۆر بن، ئەمە لە حاڵێکدا نهێنیەکەی لە زەینی خۆیدا دانابێت و بەس، بەڵام ئەگەر بەری هەڵداو بڵاوی کردەوە، ئەو کاتە کاروبارەکانی لێ تێکەڵ و پێکەڵ دەبن و ناتوانێ چۆ حوکمیان لەسەر بدات.

---

١ التاريخ الاسلامي (٩/١٩٤).

- ڕێکوپێك ئەنجامدانی ڕاوێژو لە بەلەبەرچاوگرتنی ئەنجامەکانی گرنگترە، ڕاوێژپێکراو ئەگەر بێتو دارای ڕای بەهێزو بیری تیژیش بێت، ئەوا ناتوانێت سود بە بابای ڕاوێژپێکەر بگەیەنێت تا بە تەواوەتی بابەتی ڕاوێژلەسەرکراوەکەی بۆ ڕوون نەکرێتەوە، جا ئەگەر ڕاوێژکەر هەندێك وردەکاری مەسەلەکە بشارێتەوە ئەوا تاوانی دەرهەق بە خۆی کردووەو بەهۆی ئەم جۆرە ڕاوێژەوە تووشی زیان دەبێت.

- پێویستە لەسەر سەرکردە بە خاتری شارەزابوونی لە تەواوی کاروبارەکان لەگەڵ تەواوی چینە جیاوازەکانی ئەو خەڵکەی بەڕێوەیان دەبات تێکەڵ بێت، چونکە تێکەڵاوبوون باشترین یارمەتیدەریەتی بۆ پێزانین‌و ناسینی کێشەکانیان‌و دیاریکردنی چارەی گونجاوو لەبار بۆیان، بەڵام ئەو بەرپرسەی خۆی جیادەکاتەوەو جگە لە گەورە پیاوانی ڕەعیەتەکەی لە گەڵ کەسی تر تێکەڵ نابێت، ئەو کاتە جگە لەو جۆرە هەواڵانەی لە ڕێی ئەمانەوە پێی دەگەن هیچ هەواڵێکی تر نابیستێت، کە بێگومان ئەوان هەموو ڕاستی مەسەلەکانی وەکو پێویست بۆ دەرناخەن‌و بۆی هەیە بەرنامەی نادروستیشی بۆ دادەڕێژن.

- بایەخدان بە کاروباری پاسەوانی موسڵمانان، بە تایبەتی لە شوێنی ترسناکداو جەڕپاندنی پاسەوانانی ئەمیندارو هۆشیارو دانەنانی متمانەی تەواوی لەسەریان، بەڵکو دەبێت چاودێریان لەسەر دابنرێت، بەڵکو موسڵمانان بە فریای خۆیان بکەون‌و هەلیان لە دەست دەرنەچێت.

- دەبێت لێپرسراو لە سزادانی سەرپێچیکاردا میانەڕەو بێت، نابێت گوێی نەداتێ‌و سزای نەدات، ئەمە واداری دەکات لە سەرپێچییەکەی زیاتر بکات‌و خەڵکانی تریش جورئەت بنوێنن‌و سەرپێچی ئەنجام بدەن، دەرەنجام ئاڵۆزی‌و بێ سەروبەرەیی بڵاو دەبێتەوەو کاروبار لە دەست دەردەچێت، هەروەها نابێت سزاکەی زۆر توند بکات‌و ڕەعیەت لە دەورەی خۆی بتەکێنێتەوەو توورەیان بکات‌و بگاتە ئەو ڕادەیە تاقم‌و حیزب بۆ خۆیان دروست بکەن، بەڵکو دەبێت شێوازی سزادانەکەی بە حیکمەت‌و بەبێ دەنگی‌و هەڵایسانی هەرا ئەنجام بدات، ئەمە دوای ڕەچاوکردنی پێکانی ئامانجی پەروەردەیی لەم سزایەدا.[١]

- دەبێ لێپرسراو هۆشیار بێت‌و ئاگاداری تەواوی ئەو ڕووداوانە بێت کە لە جوغزی قەڵەمڕەوی دەسەڵاتەکەی ئەودا ڕوو دەدەن، بەمە ئەندامانی ڕەعیەتەکەی هەست پێ دەکەن بایەخ بە کاروبارەکانیان دەدرێت، ئیدی چاکەخوازەکانیان لە چاکەکانیان زیاد

١ التاريخ الإسلامي (٩/١٩٥).

دەکەن‌و خراپەکارەکانیشیان واز لە سەرپێچیەکانیان دێنن، بەڵام ئەم چاودێریە نابێت بگاتە ئاستی جاسوسی‌و پەردە لەسەر مەسەلە شەخسی‌و تایبەتیەکانیان هەڵداتەوە،چونکە ئەمە سەردەکێشێ بۆتکاندنی ئابڕوویان، بەمە هێڵی پەیوەندی نێوان لێپرسراوو ئەندامانی ژێردەستی دەپچڕێت لە خۆشەویستی‌و سەرنج ڕاکێشان‌و سوپاس‌و پێزانین، تا ئەو کاتەی ئەم هێڵە پەیوەندیە بەرقەرارەو بەردەوامە ئەوا ڕێ لە گوناهباران دەگیرێت تاوانی وا بکەن کۆمەڵگا گەندەڵ بێت‌و پشێوی ڕووبدات، هەر کاتێکیش ئەم هێڵە پچڕاو تەقوای خوداش وەکو پارێزگارێك لە ئارادا نەبوو، ئەوا تەواوی بەربەستەکانی بەردەم ئارەزووەکان تەخت دەبن‌و دەرەنجام چارەسەری مەسەلەکان گران دەبێت، چونکە هێزێکی زۆرو بەهێزی دەوێت تا ڕێ لەبەردەم ئەنجامدانی ئارەزووەکان دەگیرێت، کە هەموومان بە ناهەمواریەکانی ئەم بابەتە ئاشناین.

- پێویستە لێپرسراو دانیشتنی لەگەڵ خەڵکانی ڕاستگۆو وەفادارو ئاقڵمەند هەبێت، ئەگەر جاروبار گوێبیستی ڕەخنەو ئامۆژگاری واش بێت کە پێی ناخۆشە، ئەوا بێگومان ئەم ڕەخنانە بەخێرو قازانج دەگەڕێن، چ بۆ خۆی چ بۆ ژێردەستەکانی، نابێت دانیشتنی لەگەڵ خەڵکانی گاڵتەچی‌و دنیایی بێت، ئەگەر بە قسەکانیان‌و مەتح‌و ستایشەکانیان شادومانیش بێت، چونکە ئەوانە دەبنە ئاستەنگێك لە نێوان خۆی‌و بیرکردنەوە لە کاروبارە جیدیەکان، کە خووشی پێوەگرتن وازی پێ لێ ناهێنرێن تا هێندە ناخایەنێ بەڵاو وەیشوومەو نەهامەتی گەمارۆی خۆی‌و خەڵکانی ژێردەستی دەدەن‌و لەنێویان دەبەن.

- دەبێ لێپرسراو ڕاستگۆیانەو لێبڕاوانە ڕووبەڕووی دوژمن ببێتەوەو ترس‌و لەرز داینەگرێت، دەنا ئەم ترس‌و بیمەی ئەو تەشەنە دەکات‌و وەك دەردەپەتا هەناوی سەربازەکانیشی دادەگرێت‌و دەرەنجام تێکشکان‌و دۆڕان دەبێتە بەشیان، هەروەها دەبێت لە حاڵەتی ئاساییشدا ئازایەتی‌و سام‌و هەیبەت لە هەڵوێستەکانیدا ڕەنگ بداتەوە، نابێت لاواز بێت‌و لاوازیەکەی سەربکێشێت بۆ ئەوانەش لە ژێردەستیدان‌و دەرەنجام هەم ئاستی کار هەم ئاستی بەرهەم دابەزێت.

- دەبێت سەرکردە لە دزی‌و پاشقولدان دوورەپەرێز بێت، نابێ لەکاتی جەنگداو پێش دابەشکرانی دەستکەوتەکان هیچ بۆ خۆی هەڵبگرێت‌و، نابێت لە حاڵەتی ئاساییشدا مشتێك لە دارایی گشتی هەڵبگرێت کە سوراوسور دەزانێت بەپێی شەریعەت بۆی حەڵاڵ نیە، وەکو وەرگرتنی ئەو دەست‌و دیاریانەی لە هەقی دوور دەخەنەوە، چونکە ئەمەش بە دزی

ـەمنرێت، (دزی)یش وەك لـە وەسیێتەکەدا هـاتووە مـرۆڤ لـە هـەژاری نزیـك دەکاتـەوەو ـەرکەوتنیشی لە دەست دەدات.

ـ لە ڕستەی سوودەکانی ئەم وەسێتە، مەزنایەتی خودی وەسـێتەکەی (أبـوبکر)مـان بـۆ ـەردەکەوێت کە ئاراستەی یەکێك لە سوپاسالارەکانی دەکات، بۆمان دەردەکـەوێت کـە ئـەو بە هەموو بیروزەینی خۆی لەگەڵ کێشەی موسڵمانان ژیـاوەو دانیـاوە چ شـتێك ڕووبـەڕووی سەرکردەکانی دەبێتەوە، هەوڵیداوەو چ شتێك قازانجەو دەبێتە دەرمان بۆ چارەسـەری ئـەو کێشانەی تێـی دەکـەون پێشکەشیان بکـات، ئـەم وەسـێتەو نموونـەکانی ئـەم وەسـێتەی خەرمانی هەڵوێستە بێ شومارەکانی ئەبو بەکر بەرەکەتدارتر دەکەن.[1]

لە ڕیوایەتێکدا هاتووە کە ئەبوبەکر بوارە مرۆڤدۆستیەکەی ئایینی ئیسلامی بۆ سوپاکەی (یەزید) لەبیرنەچووو وەسێتی بۆ کردو هەر (١٠) خاڵەکەی دەستووری ئیسلامی بـۆ حاڵـەتی جەنگ بۆ خستەڕوو، کە خـۆی لـە مرۆڤدۆسـتی‌و شارسـتانیەتی ئیـسلامی‌و گیانـە پـڕ سـۆزو بەزەییەکەیدا بەرجەسـتە دەکـات، ئـەم وەسـێتە لـە لایـەن (ئەبوبـەکر)ەوە بـە شـێوەیەك دەربڕدراوە کە کتومـت لـە پێغەمبـەر (ﷺ)یـەوە وەرگرتـووە، پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: ((أيها النـاس: قفـوا: أوصـيكم بعـشر فاحفظوهـا عـني: لا تخونـوا، ولا تغلـوا، ولا تفـسدوا، ولا تمثـوا، ولا تقتلوا طفلاً ولا شـيخاً كـبيراً، ولا إمـرأةً، ولا تعقـروا نخـلاً ولا تحرقـوه، ولا تقطعـوا شجرة مثمرة، ولا تذبحوا شاة، ولا بعيراً إلا لأكله، وسوف تمرون بـأقوام قـد فرغـوا أنفـسهم في الـصوامع، فـدعوهم ومـا فرغـوا أنفـسهم لـه... إنـدفعوا باسـم الله))[2]، واتـە: (ئـەی خەڵکینـە: ڕاوەستن (١٠) وەسێتتان بۆ دەکەم، لێمی وەربگرن: خیانەت‌و ناپاکی نەکـەن، دزی نەکـەن، گەندەڵکاری نەکەن، تەرمی کوژراو نەشێوێنن، منداڵ‌و پـیرو ژن نـەکوژن، دارخورمـا بڕینـدار نەکەن‌و نەیسوتێنن، درەختـی بـەردار نـەبڕن، مـەڕو وشـتر سـەرنەبڕن مەگـەر بـۆ خـواردنی خۆتان، لەمـەولاو لـە ڕێگـادا بـە پـەنا خەڵکانێکدا ڕادەبـوورن خۆیـان بـۆ نێـو پەرستگاکان تەرخان کردووە، لە خۆیان‌و پەرستنەکەیان گەڕێن،.. بەناوی خودا بەڕێکەون).

(یەزید) زۆری سوود لەم وەسێتە وەرگرت، کاتێك (شام) لـە سـەردەمی (عومـەر)دا فـەتح کرا، (عمر) (یەزید)ی کردە والی (فەلەستین)و دەوروبـەری، ئـەمجا (ئـەبو عوبەیـدە) بـەر لـە

---

١ التاريخ الاسلامي (٩/١٩٦).

٢ صور من تسامح الحضارة الاسلامية مع غير المسلمين، سلامة الهرفي (ص: ٦٢)، نقلا عن تاريخ الطبري (٣/٢٢٧).

مردنی (موعازی کوڕی جەبەل)ی لە جێی خۆی دانا، ئەویش لە کاتی سەرەمەرگیدا (یەزیدی کوڕی ئەبی سوفیان)ی لە جێی خۆی دانا، (یەزید)یش پێش مردنی (معاویە)ی برای لەجێی خۆی دانا، مەرگی هەموو ئەم والیانە بەهۆی (طاعون)ی (عمواس) بوو لە ساڵی (١٨)ی کۆچیدا، وتراویشە: (یەزید) لە ساڵی (١٩)ی کۆچی‌و دوای فەتحکرانی (قیساریە) کۆچی دوایی کردووە، دەشڵێن: (یەزید) پێش فەتحی (قیساریە) مردو، (معاویە) ئەوێی فەتح کرد.[1] (أبو إسماعیل محمد کوڕی عبدالله ی بصری) دەڵێت: (عمر) زۆری پەرۆشی (یەزید) بوو، نامەی بۆ (معاویە) نووسی‌و کردی بە والی شام.[2]

٢ـ عوتبەی کوڕی ئەبی سوفیان: نازناوی (أبا ولید) بوو، لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)دا لە دایك بوو، (عمری کوڕی خەتاب) کردی بە سەرکاری (طائف)و کۆکردنەوەی زەکاتی ئەوێ، ئەمجا دوای مەرگی (عمروی کوڕی عاص) لە لایەن (معاویە)وە کرایە والی (مصر)، گێڕدراوەتەوە: کاتێك (عوتبە) سەرکاری (مەککە) دەبێت دەشتەکییەك رووبەڕووی دێت‌و پێی دەڵێت: ئەی خەلیفە، عوتبە دەڵێت: نەتپێکا بەڵام لە پەناتدا، کابرا دەڵێت: ئەی برای خەلیفە، عوتبە دەڵێت: گوێم لێیە‌و بڵێ، کابرا دەڵێت: پیرێکی (بەنی عامر)ە بە ئامۆزایەتی خۆت لێ دەکات بە خزم‌و بە خاڵۆزایەتیش خۆت لێ دەکات بە کەسێکی تایبەت،[3] سکاڵای زۆری مندالّ‌و خێزان‌و شێلانی چەرخی زەمانە‌و توندو تیژی هەژاری‌و هاتنی زیان لە دوای زیانی خۆی بۆ لا هێناوی، هێندەت لە لایە بەشی بدەی‌و لە هەژاری ڕزگاری بکەی‌و نائومێدی‌و ناگوزوری لەسەر لابەری، داوای لێخۆشبوونی خودا دەکەم لە بەرانبەر هێنانی سکاڵام بۆ لات‌و داوای لێ دەکەم پشتیوانم بێت لە بەرانبەرتدا. عوتبە دەڵێت: فەرمانمان دا بێ نیازت بکەین‌و بتدەینێ، بەڵکو ئاوڕدانەوەی ئێستامان لە تۆ جێگەی بێ ئاگابوونەکەی پێشداممان لە بەرانبەرتدا بۆ بگرێتەوە.[4]

عوتبە وتاربێژێکی زمانپاراوو قسەڕەوان بوو، وتراوە: لە (بەنی ئومەییە)دا وتاربێژی بەهێزی وەکو ئەو نەبووە،[5] ساڵێك لە (مصر) والی بووو ئەمجا لە ساڵی (٤٤)ی کۆچی لەوێ وەفاتی کردو نێژرا، دەشڵێن لە ساڵی (٤٣)دا وەفاتی کردووە.[6]

١ التبيين في أنساب القريشيين، (ص: ٢٠٥).
٢ التبيين في أنساب القريشيين، (ص: ٢٠٥).
٣ المصدر نفسه (ص: ٢٠٥)، قادة فتح الشام ومصر (ص: ٩٩).
٤ التبيين في أنساب القريشيين، (ص: ٢٠٨).
٥ المصدر نفسه (ص: ٢٠٨).
٦ المصدر نفسه (ص: ٢٠٨).

٣ـ عەنبەسەی کوڕی ئەبی سوفیان: بە (أبا عثمان) ناسرابوو، لە (بەنی ئومامە)وە ڕیوایەت کراوە: عەنبەسە لە کاتی سەرەمەرگیدا ئارامی لێ هەڵگیرابوو دادو فوغانی دەکردو دەگریا، دەوروبەر وتیان: ئەی (ئەبا عوسمان) بۆ دەگریەی‌و چ شتێك خەمبارت دەکات، خۆ تۆ لەسەر ڕاستە شەقامی ئیسلام بوویت‌و (ان شاء الله) کە ڕێ‌و ڕەوشتت جوان بووە؟!، زیاتر گریاو خەمبار بووو وتی: چ بەربەستێك هەیە ڕێی گریان‌و خەفەتباریم لێ بگرێت کە دەبینم دەرچوون لەم دنیایە بۆ دنیایەکی سامناکە، من نازانم سبەینێ بەسەر چیدا دەکەوم، کردەوەیەکی گەورەی وا چاکم لە پێش خۆمدا نەناردووە متمانەی پێ بکەم‌و دڵی خۆمی پێ بدەمەوە.[١]

٤ـ (ئوم حەبیبەی کچی ئەبو سوفیان) (خودا لێی ڕازی بێت): ناوی (ڕەملەی کچی ئەبی سوفیان)ە، هاوسەری پێغەمبەری خودا (ﷺ)ەو دایکی ئیماندارانە، نازناوی (ئوم حەبیبە)یە، زیاتر بەمە ناوبانگی دەرکردووە لە ناوەکەی، دایکی ناوی (صەفیەی کچی ئەبیلعاسی کوڕی ئومەییە)یە، (١٧) ساڵ بەر لە نێردرانی (محمد المصطفى) بە پەیامی ئیسلامەوە لە دایك بووە، پێش پێغەمبەر (ﷺ) هاوسەری (عبدالله ی کوڕی جەحشی کوڕی ڕەبابی کوڕی یەعموری ئەسەدی بەنی ئەسەدی کوڕی خەزێمە) بووە، هەردووکیان پێکەوە موسڵمان بوون‌و بەرەو (حەبەشە) کۆچیان کردو (حەبیبە)ی لێ بە وەلەد بوو، بە ئەوەوە ناوی دەرکرد، ئەمەو (عبیدالله ی کوڕی جەحش)ی هاوسەری لە دینی ئیسلام پاشگەز بۆوەو بوو بە نەسرانی‌و هەر لەسەر ئەم دینەش لەنێو چوو، (ئوم حەبیبە)ش لەسەر (ئیسلام) مایەوەو بە هۆی بەخششی خوداوە ئیسلام‌و هیجرەتی بە نسیب بوون‌و، خودای باڵادەست هاوسەرەکەی بۆ گۆڕی‌و بەڵکو بە باشترین هاوسەرو مرۆڤ پاداشتی دایەوە کە گەورەو سەروەرمان (محمدی کوڕی عبدالله)بوو (ﷺ)، (ئوم حەبیبە) (خودا لێی ڕازی بێت‌و لە خۆشی ڕازی بکات) لە ڕووی خزمایەتیی پشتەوە، نزیکترین هاوسەری بووو، لە ڕووی مارەییشەوە مارەیی ئەو لە هی هەموو هاوسەرەکانی زیاتر بوو.[٢]

(ذهبي) سەبارەت بە (ئوم حەبیبە) دەڵێت: ئەو لەو کیژانە بوو کە ئامۆزای پێغەمبەر (ﷺ) بوون‌و لەنێو هاوسەرەکانیشیدا نزیکترین‌و بەڕێزترین خزمی بوو، هیچ کامێك لە هاوسەرەکانی بە ئەندازەی مارەیی ئەو مارەیی نەدابوونێ‌و ئەوانەی دوای ئەویش

---

١ التبيين في أنساب القرشيين، (ص: ٢٠٨).

٢ الطبقات لإبن سعد (٨/٩٦ـ١٠٠)، مجمع الزوائد (٩/٢٤٩).

هاوسەرگیری لەگەڵ ئەنجامدان هێندەی مارەیی ئەوی نەدانێ،ماڵەکەی لە هی هەمووان دوورتر بوو، هێشتا لە (حەبەشە) بوو پێغەمبەر (ﷺ) مارەی بڕی، (نەجاشی)ی پاشای حەبەشە سەرپەرشتی گرێبەستەکەی کردو ئەندازەی مارەییەکەی لە جیاتی پێغەمبەر (ﷺ) پێشکەش کرد کە (٤٠٠) دینار بوو، کەلوپەلو کاڵای تریشی بۆ سازکرد.[١] سیفەتگەلێکی ڕەندی باسکراون، کە هەموویان دەبنە بەڵگە بۆ بەرزی جێگەو پێگەیو نەفسی بەرزی ئەو (خودا لێی ڕازی بێتو لە خۆشی ڕازی بکات)، هەندێك لەو سیفەتانە:

أ- ئەو لەڕیزی ئەو کۆچەرانەدا بوو کە لە کاتی کاروانی دووەمی کۆچی (حەبەشە)دا بە خۆیانو دینەکەیانەوە بەرەو ئەو وڵاتە بەڕێکەوتن، (حاکم) لە (ئیسماعیلی کوڕی عەمروی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص)ەوە دەگێڕێتەوە: (ئوم حەبیبە) وتی لە خەومدا خەونم بە (عبیداللە ی کوڕی جەحش)ی هاوسەرمەوە دیتو بە ناشیرینترین دەمو چاوو قێزەونترین شێوەوە هاتە بەر چاوم، وتم بە خوا حاڵی گۆڕاوە، کە بەیانی بووەوە دەبیستم دەڵێت: هۆ (ئوم حەبیبە) من تەماشای دینەکانم کرد نەمدی هیچ دینێك لە دینی (نەسرانیەت) باشتر بێتو چوومە سەری، ئەمجا چوومە سەر دینی (محمد)، پاش ئەمە پەشیمان بوومەوەو بوومەوە (نەسرانی)، دەڵێت: پێم وت: بە خوا باشتر نیەو خەونەکەم ڕێك بۆ گێڕایەوە، گوێی پێ نەدا، ئیدی عادەتی بە خواردنەوەی (مەی) گرتو لەسەری مرد، کاتێك لە خەونمدا دەبیستم یەکێك بانگم دەکات دەڵێت: (ئەی دایکی ئیمانداران)، منیش لێکم دایەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەمخوازێت، دەڵێت: هەر ئەوەندە عیددەم تێپەڕی زانیم نێردراوی (نەجاشی) لەبەر دەرگای ماڵەکەم وەستابوو داوای هاتنە ژوورەوەی دەکرد، -نێردراوەکە کەنیزەکێك بوو بە ناوی (ئەبرەهە)و کاروباری (پۆشاكو بۆنو چەور)ی نەجاشی بەڕێوە دەبرد-، هاتە ژوورەوەو وتی: پاشا پێت دەڵێت کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) نامەیەکی بۆ نووسیوم، تا لە ئەوت مارە بکەم، دەڵێت: وتم: دەك خودا خۆشمژدەت بکات، وتی: مەلیك دەڵێت: با یەکێك بکاتە وەکیلی خۆی بۆ گرێبەستی هاوسەرگیریەکە، منیش بە دوای (خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص)م دا ناردو کرمە وەکیل.[٢] لەم ڕیوایەتەدا جوانڕەوشتیو سیفەتبەرزی (ئوم حەبیبە)ی دایکی ئیمانداران دەردەکەوێت کە ئەو: یەکێك

---

١ سیر أعلام النبلاء (٢/٢١٩).

٢ المستدرك، کتاب معرفة الصحابة (٤/٢٠-٢١).

بووە لەوانەی شەرەفی کۆچی حەبەشەی پێ بەخشراوەو لەسەر ئیسلام‌و کۆچەکەشی سەقامگیر بووە.[١]

ب- سیفەتێکی تری بەرزی ئەمە بوو کە رێزی لە رایەخەکەی پێغەمبەر (ﷺ) گرت‌و نەیهێشت باوکی لەسەری دانیشێت، کاتێك (أبو سفیان) بە مەبەستی ئەنجامدانی ئاشتی لە نێوان پێغەمبەر (ﷺ)و (قورەیش)دا هاتە (مەدینە)و چووە مالّی (ئوم حەبیبە)و ویستی لەسەر رایەخەکەی پێغەمبەر (ﷺ) دانیشێت بەلاّم (ئوم حەبیبە) لێنەگەڕا دانیشێت، چونکە ئەو ئەوکاتە موشریك بوو موسلّمان نەببوو.[٢] (إبن سعد) بە سەنەدەکەی خۆی لە (محمدی کوڕی مسلم ی زوهەری)یەوە دەگێڕێتەوە: کاتێك (أبو سفیانی کوڕی حەرب) هاتە (مەدینە)و چووە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) -ئەو دەمە پێغەمبەر (ﷺ) نیەتی فەتحی مەککەی هێنابوو- گفتوگۆی لەگەلّ پێغەمبەر (ﷺ) کردو داوای درێژکردنەوەی (سولّحی حودەیبیە)ی دەکرد، پێغەمبەر (ﷺ) قبولّی نەکرد، جا هەستاو چووە لای (ئوم حەبیبە)ی کچی، بەرەو لای رایەخەکەی پێغەمبەر (ﷺ) رۆیشت تا لەسەری دانیشێت، بە پەلە پێچایەوە، (أبوسفیان) وتی: کیژۆلّەکەم! ئەم رایەخەت بە لاوە بەنرخترە یان من؟، (ئوم حەبیبە) وتی: بەلّکو ئەمە رایەخی پێغەمبەری خودایە (ﷺ)، تۆ مرۆڤێکی بتپەرستی پیسی!، (أبو سفیان) وتی: ئەی کیژەکەم! دوای من تووشت بە تووشی شەڕەوە بووە.[٣]

ج- سیفەتێکی تری: (إبن سعد)و (حاکم) لە (عەونی کوڕی حاریس)ەوە دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: گوێم لێبوو (عائیشە) دەیوت: (ئومحەبیبە)ی هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) لە کاتی گیانەلاّیدا بانگی کردم‌و وتی: ئەوەی لەنێوهەوێساراندا هەبووە لە نێوان ئێمەشدا هەبووە، خودا لە منیش‌و لە تۆش خۆش بێت لە بەرانبەر ئەوەی هەبووە، (عائیشە) دەلّێت: پێم وت: خودا لە هەموو ئەو گوناهانەت خۆش بێت‌و ئازادت بکات لێیان، دەلّێت: (ئوم حەبیبە) وتی: شادومانت کردم خودا شادومانت بکات، ئەمجا لە دوای (أم سلمە)ی ناردو ئەوەی بە منی وتبوو بە ئەویشی وت: ئەمەو لە سالّی (٤٤)ی کۆچی‌و لە سەردەمی (معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان) (خودا لێیان ڕازی بێت) کۆچی دوایی کرد.[٤]

---

١ العقيدة في أهل البيت (ص: ١١٣).

٢ المصدر نفسه (ص: ١١٣).

٣ سير أعلام النبلاء (٢/٢٢٣)، الطبقات الكبرى (٨/٩٩-١٠٠).

٤ سير أعلام النبلاء (٢/٢٢٣).

**٥ـ (أم الحكم)ی کچی ئەبو سوفیان (خودا لێی ڕازی بێت):**

(أم عبدالرحمن‌و ئومولحەکەمی کچی ئەبی سفیان)ە، لە موسڵمانەکانی فەتحە، لە کاتی دابەزینی ئایەتی دەیەمی سورەتی (الممتحنـة)دا: ﴿وَلَا تُمْسِكُوا۟ بِعِصَمِ ٱلْكَوَافِرِ﴾[1]، لە باخەڵی (عیازی کوڕی غەنەمی فەهری)دا بوو، یەکسەر تەڵاقی لێ سەند، ئەمجا (عبدالله ی کوڕی عوسمانی سەقەفی) خواستی.[2]

**٦ـ عیززەی کچی ئەبی سوفیان (خودا لێی ڕازی بێت):**

(إبن شهاب) لە فەرموودەی (ئوم حەبیبە) لە بابەتی (الرضاع)دا باسی کردووە، (مسلم)یش فەرموودەکە دێنێت‌و لە (ئوم حەبیبە)وە ڕیوایەت دەکات، کە (ئوم حەبیبە) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) پێویستت بە خوشکم نیە؟ فەرمووی: ((ما أصنع بها؟)) واتە: چی لەگەڵ بکەم؟ وتی: مارەی بکەی لە خۆت، فەرمووی: ((أتحبين ذلك)) واتە: حەز بەمە دەکەی؟ وتی: بەس تایبەت نی بە من، بەڵام پێم خۆشە خوشکم لە خێرو بێر(ی زاتی پیرۆزت)دا بەشدارم بێت.[3] ئەمەو پێغەمبەری خودا (ﷺ) بۆی ڕوون کردەوە کە ئەمە –واتە مارەکردنی(عزة)– بۆ ئەو حەڵاڵ نیە،[4] چونکە کۆکردنەوەی دوو خوشك لە ئیسلامدا دروست نیە.[5] ئەمەو پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە ساڵی (٦)ەمی کۆچیدا هاوسەرگیری لەگەڵ (ئوم حەبیبە)ی کیژی ئەبی سوفیاندا ئەنجام دا.[6] ئەو ڕۆژە تەمەنی (ئوم حەبیبە) سی‌و سێ (٣٣) ساڵ بوو، (ذهبي) دەڵێت: لەو کاتەدا (خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص) بەرەو مەدینەی هێنا تەمەنی سی‌و چەند ساڵێك بوو[7] و لە ساڵی (٤٤)ی کۆچیدا کۆچی دوایی کرد.[8]

**٧ـ ئەمیمەی کچی ئەبی سوفیان:**

(ئەمیمە) لە (حوەیتەبی کوڕی عبدالعُزّى)ی هاوسەری کوڕوکچێکی بە ناوەکانی(ئەبو سوفیان و، جویریە)ی لێ کەوتوونەتەوە، (إبن قدامة) لە کتێبی (التبيين في أنساب القريشيين)دا بە کورتی باسی لێوە کردووە.[9]

---

١ الممتحنة (١٠).

٢ التبيين في أنساب القريشيين، (ص: ٢٠٩).

٣ مسلم، رقم (١٤٤٩).

٤ مسلم، رقم (١٤٤٩).

٥ الدولة الأموية المفترى عليها (ص: ١٤٢).

٦ سير أعلام النبلاء (٢/٢٢٠).

٧ المصدر نفسه (٢/٢٢٢).

٨ المصدر نفسه (٢/٢٢٢).

٩ التبيين في أنساب القريشيين، (ص: ٢٠٩).

## پێنجەم: هاوەسەکانیو ڕۆڵەکانی (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت)؛

١ـ (مەیسونی کچی بەحدەلی کەلبی) یەکێك بوو لە هاوسەرەکانی، ڕۆڵەکانی ئەم هاوسەرەی بریتی بوون لە: (یەزید)و کچێکیش بە ناوی (ئەمەتو رب المشارق) واتەی بەندەی پەروەردگاری خۆرهەڵاتەکان، ئەم کیژە بە منداڵی مرد.[١] (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) ڕێزی زۆری بۆ(مەیسون)هەبوو و بە گەورەی دادەنا، بەڵام هەرچی مەیسون بوو، خەمو مەراقی بۆ هەوارگەی منداڵی خۆی لە دەشتودەر دەخواردو هەمیشە یادی کەسوکارو ژیانە سادەکەی خۆیانو گوزەرانە بێ کێشەو بگرەو بەردەکانی نیشتمانەکەی دەکردەوەو ڕقی لە ژیانی نێو کۆشکەکان بە نۆکەرو قەرەواشەکانی نێویشی دەبۆوە، ڕۆژێك لە ڕۆژان بیابانەکەی خۆیانی یادکردەوەو بە هۆنراوەیەك خاكو خۆڵو خەڵکەکەی لاواندەوەو بە هەوارگەی لەدایکبوونو سەردەمی منداڵی خۆی هەڵگوتو ،گریاو هەنیسکی هەڵێنانو دەنگی بەرز بۆوە، یەکێك لە قەرەواشەکان پێی وت: ئەوە چی دەتگریەنێت، کە ژیانی شایانەو شاژنانەت وەکو هی (بەڵقیسا)یە؟ ، هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو ئەم سرودەی چڕی:

| | |
|---|---|
| لبيت تخفق الارواح فيه | أحب إليّ من قصر منيف |
| وبكر يتبع الاظعان سبقاً | أحب إليّ من بغل زفوف |
| وكلب ينبح الطّراق عني | أحب إليّ من قط أليف |
| ولبس عباءة وتقر عيني | أحب إليّ من لبس الشفوف |
| وأكل كُسيرة في كسر بيتي | أحب إليّ من أكل الرغيف |
| وأصوات الرياح بكل فج | أحب إليّ من نقر الدفوف |
| وخرق من بني عمي نحيف | أحب إليّ من علج عنيف |
| خشونة عيشي في البدو أشهى | الى نفسي من العيش الظريف |
| فما ابغي سوى وطني بديلاً | فحسبي ذاك من وطن شريف |

کاتێك (معاویە) هاتە ژوورەوە، کارەکەرەکە هەستی پێکرد کە گوێی لە تەواوی قسەکانی (مەیسون) بووە، وتراویشە: کاتێك (مەیسون) سرودەکەی دەچڕی (معاویە) گوێی ڕاگرتبووو هاتە ژوورەوە وتی: کیژەکەی (بەحدەل) بە من ڕازی نەبوو تا کردمی بە پیاوێکی توندو تیژ، تازە تەلاقی بکەوێت بۆ خۆی ئازادە، پێی بڵێن هەرچی لەنێو کۆشکدا هەیە هی خۆیەتیو با

---

١ سير أعلام النبلاء (٢/٢٢٣).

لەگەڵ خۆی ببات، ئەمجا بەرەو ماڵە بابیو خزمانی بەڕێی کردەوەو (یەزید)ی کوڕیشی لەگەڵ بووو، لەوێ بە زمانپاراویو ڕەوانبێژی پەروەردە بوو.[١]

(البغدادي) (بەر ڕەحمی خودا بکەوێت) لە کتێبی (خزانة الأدب)دا ئاوا دەڵێت: کاتێك (معاویە) تەلاقیدا پێی وت: تا ئێستا هاوسەرم بووی بەلام ئێستا دەستت لێ بەردرا: وەلامی دایەوە: تا هاوسەر بووین شادومان نەبووین، کە دەستیشمان لێ بەردرا ئاهی بۆ هەڵناکێشین.[٢] ئەم شاعیرە چاکی وتووە کە دەڵێت:

| | |
|---|---|
| وحبب أوطان الرجال إليهم | مأرب قضاها الشباب هنالكا |
| إذا ذكر الأوطـــان ذكّرتهم | عهود الصبا فيها فحنّوا لذلكا[٣] |

٢ـ (فاختەی کچی قەرەزەی کوڕی عبدعمروی کوڕی نۆفڵی کوڕی عەبد مناف) هاوسەرێکی تری معاویە بوو: ڕۆڵەکانی ئەم هاوسەرەی بریتی بوون لە: (عبداللهو عبدالرحمن)، (عدبالله) کەودەنو لاواز بووو بە (أبا الخير) ناسرابوو، بەلام (عبدالرحمن)[٤] بە منداڵی کۆچی دوایی کرد.

٣ـ (کەنودی کچی قەرەزە)ی خوشکی (فاختە) هاوسەرێکی تری معاویە بوو، پاش مەرگی(فاختە) خواستیو لە کاتی فەتحی (قوبرِوس)دا لەگەڵی بوو.[٥]

٤ـ (نائیلەی کچی عەمارەی کەلبی) هاوسەرێکی تری معاویە بووو، پاشان تەلاقی دا.[٦]

لە کیژەکانی معاویە: (ڕەملە): کە (عەمروی کوڕی عوسمانی کوڕی عەففان) خواستی وبوو بە هوسەری ئەو،[٧] (هیند): شوی بە (عبداللهی کوڕی عامر) کرد،[٨] هەروەها عائیشەو عاتیکەو سەفییە.[٩]

---

١ شاعرات العرب، (ص: ٣٩٦ـ٣٩٧)، نساء عصر التابعين، أحمد خليل (ص: ٤٣).
٢ خزانة الادب (٣/٥٩٣)، نساء عصر التابعين، (ص: ٤٣).
٣ نساء عصر التابعين، (ص: ٤٣٤).
٤ تاريخ الطبري (٦/١٤٧).
٥ البداية والنهاية (١١/٤٦٢).
٦ المصدر نفسه (١١/٤٦٣).
٧ المصدر نفسه (١١/٤٦٣).
٨ المصدر نفسه (١١/٤٦٤).
٩ دراسة في تاريخ الخلفاء الأمويين (ص: ١٢٩).

## شەشەم: موسڵمانبوونی (معاويه) (خودا لێی ڕازی بێت)و کەمێك لە کردارە چاکەکانی:

معاویە هاوڕێ لەگەڵ باوکی‌و یەزیدی برای (خودا لێیان ڕازی بێت) لە ڕۆژی فەتح(ی مەککە)دا موسڵمان بوو،[1] لەسەر قسەی مەشهور، بەڵام لە خۆی بیستراوە کە وتوویەتی: ساڵی (٧)ەمی کۆچی‌و لە کاتی (عەمرەی قەزا)دا موسڵمان بووم، بەڵام ئەمەم لە ترسی باوکم پەنهان کرد، ئەمجاپێی زانی‌و پێی وتم: ئەمە یەزیدی براتەو زۆر لە تۆش باشترەو هەر لەسەر دینی هۆزەکەیەتی، پێم وت: زۆرم لە خۆم نەکردووە، ئەمەو پێغەمبەری خودا (ﷺ) بۆ (عەمرەی قەزا) هاتە (مەککە)و من ئیمانم پێ هێنا، ئەمجا ساڵی (فەتح) تەشریفی هات‌و ئیسلامبوونی خۆم ئاشکرا کرد، چوومە خزمەتی‌و بووم بە کاتبی بەردەستی.[2] (معاويه) (خودا لێی ڕازی بێت) لەگەڵ پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئامادەی جەنگی (حونەین) بووو (١٠٠) وشترو (٤٠) ئۆقیە زێڕی پێدا.[3] زانایان چاکەگەلێکی زۆری (معاويه)یان ژماردوون‌و باس کردوون، لەنێو ئەو چاکانەیدا:

### ١ـ لە قورئانی پیرۆزدا:

معاویە (خودا لێی ڕازی بێت) لە غەزای (حونەین)دا بەشدار بوو، خودای بەرزو باڵادەست فەرمووی: ﴿ ثُمَّ أَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا وَعَذَّبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٦﴾ ﴾[4]. (معاويه) (خودا لێی ڕازی بێت) یەکێك بوو لە ئامادەبووانی غەزای (حونەین)و یەکێکیش بوو لەو ئیماندارانەی لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) کە خودا بارانی ئارامی‌و ئۆخژنی بەسەردا باراندن.[5] هەروەها (معاويه) (خودا لێی ڕازی بێت) یەکێك بوو لەو کەسانەی خودا بەڵێنی بەهەشتی پێداون، خودای بەرز دەفەرموێت: ﴿لَا يَسْتَوِى مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ ٱلْفَتْحِ وَقَٰتَلَ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُوا۟ مِنۢ بَعْدُ وَقَٰتَلُوا۟ ۚ وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾.[6] عماویە (خودا لێی ڕازی

---

١ الإصابة (٤٣٣/٣)، التبيين في أنساب القريشيين.

٢ البداية والنهاية (٤٩٦/١١).

٣ المصدر نفسه (٤٩٦/١١).

٤ التوبة (٢٦).

٥ الفتاوى (٤٥٨/٤).

٦ الحديد (١٠).

بێت) یەکێك بوو لەو کەسانەی خودا بەڵێنی بەهەشتی پێدان، چونکە ئەو لە غەزاکانی (حونەین)و (طائف)دا جەنگاو ماڵیشی لەڕێدا بەخشی.[1]

**٢ـ لە سوننەتدا:**

أـ نزای پێغەمبەر (ﷺ) بۆ (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) کە دەیفەرموو: ((اللهم اجعله هادياً، مهدياً، واهدبه))[2] واتە: خودایە بیکەی بە ڕێنومای خێر، خودایە ڕێنمای بکەی، خەڵکی پێ ڕێنما بکە.

هەروەها دەیفەرموو: ((اللهم علم (معاوية) الكتاب والحساب وقه العذاب))[3]، واتە: خودایە نووسینو حیساب فێری (معاویە) بکەو لە سزای بپارێزە.

بـ ئیمامی (موسلیم) لە ڕێی (عبدالله ی کوڕی عباس) (خودا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە، (عبدالله) دەڵێت: من لەگەڵ مندالآن گەمەم دەکرد، پێغەمبەری خودا (ﷺ) هات، خۆم لە پشت دەرگا شاردەوە، دەستێکی لە پشتمداو فەرمووی: ((إذهب وادعُ لي معاوية)) بڕۆ معاویەم بۆ بانگ بکە، دەڵێت: جا چوومو هاتمەوە وتم: نان دەخوات، دەڵێت: ئەمجاریش فەرمووی: ((إذهب وادعُ لي معاوية)) بڕۆ معاویەم بۆ بانگ بکە، دەڵێت: چوومو هاتمەوە وتم: هەر خەریکی خواردنە، جا فەرمووی: ((لا أشبع الله بطنه))[4] دەك خودا سكی تێر نەکات.

(نووي) لەسەر ئەم (فەرموودە)یە دەڵێت: (موسلیم) (ڕەحمەتی خوای بەسەردا بڕژێت) بۆیە ئەم فەرموودەیەی هێناوەتە نێو ئەم (باب)[5]ەوە، چونکە تێگەیشتووە کە (معاویە) شایەنی دوعا لێکردن نیە، فەرموودە نووسەکانی بێ لە (موسلیم)یش ئەم فەرموودەیان لە ڕیزی سیفەتە بەرزەکانی (معاویە)دا هەژماردووە، چونکە ئەمە لە حەقیقەتدا نزا بۆکردنە نەك توکلێکردن،[6] لەبەر ئەوە (إبن عساكر) دەربارەی فەرموودەی: ((لا أشبع الله بطنه))دا دەڵێت: ڕاستترین ڕیوایەتە سەبارەت بە ڕێزداریو چاکەکاری (معاویە) گێڕدرابێتەوە، دوای ئەمیش فەرموودەی: ((اللهم علمه الكتاب)) دوای ئەمەش فەرموودەی: ((اللهم اجعله

---

١ المصدر نفسه (٤/٤٩٥).

٢ الشريعة (٥/٢٤٣٧) إسناده صحيح.

٣ موارد الظمآن للهيثمي.

٤ مسلم، رقم (٢٦٠٤).

٥ ناونیشانی (باب)= من لعنه البني (ﷺ) أو سبَّه أو دعا عليه وليس هو أصلاً.

٦ شرح صحيح مسلم للنووي (١٦/١٦٥).

هادياً)).[1] سەبارەت بە هەمان فەرمودە (ذهبي) دەڵێت: زۆر پێ دەچێت ئەمە سیفەتێکی بەرز بێت بۆ معاویە، لەبەر ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ): ((اللهم من لعنته أو سببته، فاجعل ذلك له زكاة ورحمة)).[2] واتە: خوایە نەفرینم لە هەر کەسێك کرد یا قسەم پێ گوت، ئەوا ئەو نەفرەتو قسە پێ گوتنەی بۆ بگێڕە بە بەرەکەتو ڕەحمەت.

(ئەلبانی)یش دەڵێت: هەندێ فیرقە ئەم فەرموودەیە بۆ تانەو تەشەرلێدانی (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) بەکاردێنن، لەم بارەوە هیچ بەڵگەیەك نیە پاڵپشتیان بکات، ئەمە لە حاڵێکدا کە ئەو کاتبی بەردەستی پێغەمبەر (ﷺ) بووە.[3]

دەربارەی: ((لا أشبع الله بطنه)) وتراوە: ئەمە وەکو هەندێك ڕستەی تری وەکو: (قاتله الله ماأكرمه) دەك خوا بیکوژێت چ شتێك هێندەی ڕێزدار کردووە، (ويل لأمه ولأبيه ما أجوده) واوەیلا بۆ دایكو بابی چ شتێك هێندەی دڵاوا کردووە، کە ئەمانە چەند قسەیەکی سەرزاری (عەرەب)ن‌و کلتوری خۆماڵی ئەوانن، بە هەمان شێوە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەریش (ﷺ) قسەی باوی سەرزاری عەرەبەکانەو واتاکەی پێچەوانە دەبێتەوە.[4]

ج- ئیمامی (بوخاری) لە ڕێگای (ئەنەسی کوڕی مالیك)ەوەو ئەویش لە (أم حرام ی کچی ملحان)ی پوریەوە دەگێڕێتەوە، (ئەنەس) دەڵێت: پورم وتی: پێغەمبەر (ﷺ) لە نزیك منەوە خەوتبوو، ئەمجا بە زەردەخەنەوە ڕاپەڕی، وتم: چ شتێك بە پێکەنینت دێنێت؟ فەرمووی: ((أناس من أمتي عرضوا علي، يركبون هذا البحر الأخضر، كالملوك على الأسرة)) واتە: خەڵکانێکم لە ئوممەتی خۆم پێشان دران هەروەکو مەلیك وابوون لەگەڵ خێزانەکانیان سواری ئەو دەریا شین‌و سەوزە ببوون، پورم وتی: داوام بۆ بکە لە خودا لەگەڵیان بم، جا دوعای بۆ کردم، ئەمجا پێغەمبەر (ﷺ) بۆ جاری دووەم خەوتەوە، هەمان خەونی گێڕایەوەو پرویشم هەمان تکای ئاراستە کردەوەو ئەویش دوعای بۆ کردەوە، جا پورم وتی: بۆم بپاڕێوە لەگەڵ ئەو تاقمە بم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((أنت من الأولين)) تۆ لە یەکەمینەکانی. ئەنەس دەڵێت: جا پورم لەگەڵ (عوبادەی کوڕی صامت)ی هاوسەری لەگەڵ

---

١ تاريخ دمشق (٦٢/٢٤).
٢ سير أعلام النبلاء (١٤/١٣٠).
٣ السلسلة الصحيحة (١/١٦٥).
٤ الناهية عن طعن أمير المؤمنين (معاوية) (ص: ٦٩).

(معاويه)و یەکەمین پۆلی غەزاکەرانی موسڵمان سواری دەریا بوو.[١] ئەمەو کاتێك کاروانی غەزاکەرانی دەریایی گەڕایەوە، ولاخێکیان بۆ پورم هێنا سواری بێت، کە لێی نزیك بۆوە سواری بوو، هێندەی نەخایاند ولاخەکە هەڵیداشت‌و بەمە کۆچی دوایی کرد.[٢]

(إبن حجر) قسە لەسەر خەونەکەی پێغەمبەر (ﷺ) دەکات، کە فەرمووی: ((اناسٌ من أُمتي عُرضوا على غُزاة...)) لە پێکەنینەکەی پێغەمبەر (ﷺ) وا دەفامرێتەوە: کە کاتێك پلەو پایەی بەرزی ئەوانی بینیوە پێیان دڵخۆش‌و سەرسام بووە.[٣]

د- ئیمامی (بوخاری) لە ڕێگای (أم حرام)ی کچی (ملحان)ەوە (خودا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە، کە وتی: گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو دەیفەرموو: ((أول جيش من أُمتي يغزون البحر قد أوجبوا)) واتە: یەکەمین سوپا لە ئوممەتی من غەزای دەریا دەکەن بەهەشتیان بۆ واجب بووە، دەڵێت وتم: ئەی پێغەمبەری خودا من لەنێویانم؟، فەرمووی: (أنت فيهم) تۆ لەنێویاندای، ئەمجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((أول جيش من أُمتي يغزون مدينة قيصر[٤] مغفور لهم)) واتە: یەکەمین سوپای ئوممەتم کە غەزای شاری (قەیسەر) دەکەن خوا لێیان خۆش بووە، دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا من لەگەڵیانم؟ فەرمووی: ((لا))[٥] نەخێر.

(مهلب)[٦] قسە لەسەر ئەم فەرموودەیە دەکات‌و دەڵێت: ئەم فەرموودەیە سیفەتێکی بەرزی (معاويه)ی تێدایە، چونکە ئەو یەکەم کەس بوو (لە ئیسلامدا) غەزای دەریا بکات.[٧] (معاويه) (خودا لێی ڕازی بێت) وەحی بۆ پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەنووسیەوە.[٨] زیاد لەمەش نامەکانی پێغەمبەر (ﷺ)ی بۆ سەرۆك هۆزەکان دەنوویسینەوە.[٩] (معاويه) هەر لە فەتحی مەککەوە تا وەفاتی پێغەمبەری خودا (ﷺ) وەحی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دەنووسیەوە،

---

١ ئەمە لە ساڵی (٢٧)ی کۆچیدا بوو لە سەردەمی ویلایەتی (معاويه) بوو بەسەر وڵاتی (شام) لە سەردەمی خیلافەتی (عوسمان)دا.

٢ فتح الباري على صحيح البخاري (٦/٢٢).

٣ المصدر نفسه (١١/٧٦).

٤ شاری (قیصَر): واتە: (قوستەنتینیە)، فتح الباري (٦/١٢٠).

٥ فتح الباري على صحيح البخاري (٦/٢٢).

٦ موهەللەبی کوڕی ئەحمەدی کوڕی ئەبو صوفرەی ئەندەلووسی دانەری (شرح صحيح البخاري)، (٤٣٥ك) کۆچی دوایی کردووە. سەرچاوە: سير أعلام النبلاء (١٧/٥٨٩)، مرويات (معاوية) في تاريخ الطبري (ص: ٢٧).

٧ فتح الباري (٦/١٢٠).

٨ البداية والنهاية (١١/٣٩٦).

٩ الإصابة في تمييز الصحابة (٣/٤٣٤).

لەم ماوەیەدا جۆرە نزیکایەتیەکی تایبەتو مەحرەمانەی وای لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) بۆ دروست بوو کە بەمە توانی ڕاستەوخۆ زانیاری لە پێغەمبەر (ﷺ) وەربگرێتو ڕاستەوخۆش کاریگەری بکەوێتە سەر.[1]

## حەوتەم: گێڕانەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە لایەن (معاویە)وە:

معاویە (خودا لێی ڕازی بێت) یەکێکە لەو کەسانەی ڕێزی گێڕانەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)ی پێ براوە، ئەمە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەو هەر دوابەدوای فەتحی مەککەو لە تەمەنی (١٨) ساڵیەوە پابەندی پێغەمبەری خودا (ﷺ) بووو لێی جودا نەدەبووەوە،[2] بە حوکمی ئەوە ژنبراو کاتبی پێغەمبەر (ﷺ) بوو، هەلێکی گەورەو بە نرخی دەستکەوت تا سود لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) وەربگرێت، ئەمەو (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) (١٦٣) فەرموودەی[3] لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) گێڕاونەوەو، (بوخاریو موسلیم) لەسەر چوار فەرموودەی ڕێککەوتوونو، بێ لەمانە (بوخاری) چوار (٤) فەرموودەی تری بە جیا لێوە ریوایەت کردوونو (موسلیم)یش (٥) دانە.[4] لە ڕستەی ئەو فەرموودانەی (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) گێڕاونیەوە:

١ـ (معاویە) چووە لای (عبدالله ی کوڕی زوبێر)و (إبن عامر)، (إبن عامر) لەبەری هەستاو (إبن زبیر) هەڵنەستا، (معاویە) بە (إبن عامر)ی وت: وا مەکە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: ((من أحب أن يمثل له عبادالله قياماً، فليتبوأ مقعده من النار))[5] واتە: هەر کەسێك حەز بکات خەڵك بە پێوە لە بەرانبەری بوەستن، با جێگایەك لەنێو دۆزەخدا بۆ خۆی ساز بکات.

٢ـ لە (معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان)ەوە (خودا لێی ڕازی بێت) پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((إذا أراد الله بعبد خيراً فقهه في الدين)).[6] واتە: ئەگەر خودا ویستی چاکە(یەکی تایبەت) لە بەرانبەر بەندەیەکیدا بنوێنێت شارەزای دەکات لە دیندا.

---

١ الدولة الأموية المفترى عليها (ص: ١٤٥).

٢ الطبقات الكبرى (٤٠٦/٤)، خلافة معاوية، د. عمرو العقيلي (ص: ١٤).

٣ أسماء الصحابة الرواة لإبن حزم (ص: ٥٥)، مرويات خلافة (معاوية) (ص: ٣٣).

٤ سير أعلام النبلاء (١٦٢/٣).

٥ موسوعة الحديثية مسند الإمام أحمد (٤٠/٢٨)، إسناده صحيح.

٦ المصدر نفسه (٤٨/٢٨).

٣ـ لە (ئەبی سەعیدی خودری)یەوە (خودا لێی ڕازی بێت) وتی (معاویە) هاتە مزگەوت‌و بەسەر کۆڕێکدا کەوت‌و وتی: چ شتێك ئێوەی‌لێرە[١] دانیشتاندووە؟ وتیان: دانیشتووین‌و زیکری خودای بەرزو مەزن دەکەین، وتی: توخوا بێ لە ئەمە چ شتێکی تر ئێوەی لێرە دانەنیشاندووە؟! وتیان: بە خوا بێ لەمە شتێکی تر ئێمەی لێرە دانەنیشاندووە. وتی: بەڵام من بۆیە سوێندم نەدان کە گومانم لەسەر بن، کەس بە قەد من لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە ڕووی گێڕانەوەی کەمی فەرمووده (بۆ إحتیاط) نزیکتر نەبوو، پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئاوا بەسەر کۆڕێکی هاوەڵانیدا هات، فەرمووی: ((ما أجلسكم؟)) چ شتێك ئێوەی لێرە دانیشتاندووە؟ وتیان: دانیشتووین زیکری خودای بەرزو مەزن دەکەین‌و لە بەرانبەر ئەوەدا هیدایەتی داوین بۆ ئیسلام‌و بە هۆی تۆوە چاکەی لەگەڵ کردووین سوپاسی دەکەین. فەرمووی: ((الله ما أجلسكم الا ذلك؟)) توخوا جگە لەمە شتێکی تر ئێوەی لێرە دانەنیشاندووە؟ وتیان: بە خوا جگە لەمە هیچ شتێکی تر ئێمەی لێرە دانەنیشاندووە، فەرمووی: ((أما إني لم أستحلفكم تهمة لكم، وإنه أتاني جبريل عليه السلام فأخبرني أن الله عز وجل يباهي بكم الملائكة)).[٢] من بۆیە سوێندم نەدان کە گومانم لە ئێوە بێت، ئێستا جبریل (سەلامی خوای لێ بێت) هاتە لام‌و هەواڵی پێدام: کە خودای بەرزو مەزن دیمەنی کۆڕەکەتان پێشانی فریشتەکان دەدات‌و شانازیتان پێوە دەکات.

٤ـ لە (مەعبەدی جوهەنی)یەوە، وتی: کەم وابوو (معاویە) فەرموودەی لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) گێڕابانایەوە ئەم چەند وشەی نەوتبانایە، کەم وابوو ئەم وشانەی لەنێو کۆڕو کۆمەڵدا دوپات نەکردبانایەوە، دەیوت: پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو: ((مَن يُرد الله به خيرا يفقهه في الدين، وإن هذا المال حُلوٌ خضرٌ، فمن يَأخُذه بحقه يُبارك له فيه، وإياكم والتمادح، فإنَّه الذبح))[٣] واتە: هەر کەسێك خوا بیەوێت چاکەیەکی لەگەڵ بکات‌و ڕێزێکی تایبەتی لێنی شارەزای دەکات لە (دین)دا، ئەم سامانە شیرین‌و سەوزە، هەر کەس بە هەقی خۆی (نە زیاد نە کەم) لێی هەڵبگرێت بەرەکەتی بۆ تێدەکەوێت، خۆتان لە مەتحکردنی یەکتر بپارێزن چونکە ئەمە سەربڕینە.

---

١ واتە لە (مزگەوت)دا.

٢ موسوعة الحديثية مسند الإمام أحمد (٢٨/٥٢)، إسناده صحيح.

٣ المصدر نفسه (٢٨/٥٢)، إسناده صحيح.

٥ـ لە (عبدالرحمن ی کوڕی عەبد)ەوەلە معاویەوە وتی: گوێم لە پێغەمبەری خـودا (ﷺ) بوو دەیفەرموو: ((من شرب الخمر فاجلدوه، فإن عاد فاجلدوه، فإن عـادَ فاجلـدوه، فـإن عـاد الرابعة فاقتلوه))[١] واتە: هەر کەسێك (مەی) خواردەوە دارکاری بکەن، کە دووبارەی کـردەوە دارکاری بکەن، کە سێبارەی کردەوە دارکاری بکەن، کە چواربارەی کردەوە بیکوژن.

٦ـ لە (عیسای کوڕی تەڵحە)وە، وتی: گوێم لە (معاویە) بوو دەیوت: گوێم لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بوو دەیفـەرموو: ((إنَّ المـؤذنين أطـول النـاس أعناقـاً يـوم القيامـة))[٢] بانگبێـژان گەردنبەرزترین خەڵکی ڕۆژی قیامەتن.

٧ـ لە (موجاهیـدو عـەتا)وە، لـە (عبـدالله ی کـوڕی عـەباس)ەوە: دەڵێـت: کـە (معاویـە) هەواڵی پێداوە: کە ئەو بە چـاوی خـۆی پێغەمبـەری خـودا (ﷺ)ی بینیـوە قـژی سـەری بـە مەقەست بڕیوە، (موجاهدو عەتا) دەڵێن: بە (ئیبنوعەباس)مان وت: جگە لە (معاویە) کەسی تـر نیـە ئـەم هەواڵـەمان بـداتێ، جـا وتـی: (معاویـە) تۆمـەت بـۆ پێغەمبـەر هەڵنابەسـتێتو درۆودەلەسەی بۆ ناکات.

٨ـ لە (زوهەری)یەوە وتی: (حەمیدی کوڕی عبدالرحمن ی کوڕی عەوف) قسەی بۆ کردم، کە ئەو لە مەدینە گوێی لە (معاویـە) بـوو وتـاری دەداو دەیـوت: ئـەی دانیـشتوانی مەدینـە، زاناکانتان لە کوێن؟ گوێم لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بوو دەیفـەرموو: ((هـذا يـوم عاشـوراء، ولَـم يُعـرض علينـا صـيامُهُ، فمـن شـاء مـنكم أن يـصومَ فليـصُم فـإني صـائمٌ)) ئەمـە ڕۆژی عاشوڕایە (واتـە(١٠)ی موحەڕەمـە)، فـەرز نـەکراوە لەسـەرمان کـە تێیـدا بـەڕۆژو بـین، هـەر کەسێك حەز دەکات با تێیدا بەڕۆژوو بێت، ئەوا من بەڕۆژو دەبم، جا خەڵکیش بەڕۆژو بوون.[٣]

٩ـ لە (حەکـەمی کـوڕی مینـاء)ەوە ،وتـی: (یەزیـدی کـوڕی جاریـەی ئەنـساری) هـەواڵی پێداوە، کە ئەو لەگـەڵ چـەند کەسـێکی ئەنـساری (واتـە مەدینـەیی) دانیـشتبوو، معاویـەیان بەسـەردا هـات، دەربـارەی قـسەکانیان پرسـیاری لێکـردن، وتیـان: ئێمـە قـسەمان لەسـەر فەرموودەیەك دەکرد کە مەتحی (ئەنساڕ)ی تێ، (معاویە) وتی: منیش (فەرموودە)یەکتان بۆ زیاد نەکەم کـە لـە پێغەمبـەری خـودا (ﷺ)ەوە گـوێم لێبـووە؟ وتیـان: بـەڵێ ئـەی ئـەمیری ئیمانداران، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بوو دەیفەرموو: ((مَن أحبَّ الانـصار أحبَّـهُ

١ المصدر نفسه (٢٨/٦١)، إسناده صحيح.
٢ المصدر نفسه (٢٨/٧٥)، إسناده صحيح على شرط مسلم.
٣ المصدر نفسه (٢٨/٨١)، إسناده صحيح.

الله عز وجل، ومَن أبغض الأنصار أبغضه الله عز وجل))[١] واتە: هە کەسێك پشتیوانانی خۆش بوێن، ئەوا خودای بەرزو مەزن ئەو کەسەی خۆش دەوێت، هەر کەسێك ڕقی لە پشتیوانان ببێتەوە، خودای بەرزو مەزن ڕقی لێ دەبێتەوە.

١٠ـ لە (ئەبی صالح)ەوە، لە معاویەوە وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: ((من مات بغير إمام، مات ميتة جاهلية))[٢] واتە: هەر کەسێك بەبێ ئیمام‌و پێشەوا بمرێت ئەوا بە مردنێکی نەفامانە دەمرێت.

١١ـ (محمدی کوڕی کعب ی قورەزی) وتی: گوێم لە (معاویە) بوو دەیوت: گوێت لێ بوو کاتێك پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە (نوێژ) دەبۆوە ڕووی بەرەو نوێژخوێنان وەردەگێڕاو، دەیفەرموو: ((أللهم لا مانع لما أعطَيت ولا معطي لما مَنَعتَ، ولا ينفع ذا الجد منك الجدُّ))[٣] واتە: هیچ ڕێگرێك نیە بۆ ئەوەی دەیبەخشی، هیچ بەخشەرێك نیە بۆ شتێك تۆ مەنعی بکەی، هیچ دەوڵەمەنێك لە لای تۆ دەوڵەمەندیەکەی سودی پێ ناگەیەنێت.

١٢ـ لە (ئەبی بوردە)وە لە معاویەوە وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بوو دەیفەرموو: ((ما من شيء يُصيبُ المؤمن في جسده يُؤذيه، إلا كفّر الله عنهُ به من سيئاته))[٤] واتە: هەر شتێك بەر جەستەی ئیماندار بکەوێت‌و ئازاری بدات، خودا بەهۆی ئەمەوە لە گوناهەکانی دەسڕێتەوە.

١٣ـ لە (معاویە)وە (خودا لێی ڕازی بێت) وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: ((لا تزال طائفة من أُمتي ظاهرين على الحق، لا يضُرُّهم من خالفهم حتى يأتي أمر الله، وهم ظاهرين على الناس))[٥] واتە: هەمیشە کۆمەڵێك لە ئوممەتی من لەسەر هەق دەمێننەوەو سەرکەوتوون، تا فەرمانی خودا دێت‌و دنیا وێران دەبێت (ناحەزەکانیان ناتوانن زیانیان پێ بگەیەنن‌و شکستخواردوویان بکەن)، ئەوان بەسەر خەڵك (واتە کافران)دا سەرکەوتوون.

١٤ـ لە (معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان)ەوە، گوێی لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بوو، کە دەیفەرموو: ((من نَسِيَ شيئاً من صلاته فليسجد سجدتين وهو جالس))[٦] واتە: هەچ کەسێك

---

١ المصدر نفسه (٢٨/٨٥)، إسناده صحيح.

٢ المصدر نفسه (٢٨/٨٩)، صحيح لغيره.

٣ المصدر نفسه (٢٨/١٠٠)، إسناده صحيح.

٤ المصدر نفسه (٢٨/١٠٧)، إسناده صحيح.

٥ المصدر نفسه (٢٨/١١٨)، إسناده صحيح على شرط مسلم.

٦ المصدر نفسه (٢٨/١١٨)، صحيح لغيره.

شتێکی لە نوێژەکەیدا لەبیر چوو، با لە کۆتایی تەحیاتداو پێش سەلامدانەوە دوو سوژدە بەرێت.

١٥ـ لە (معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان)، لە پێغەمبەر (ﷺ)ەوە فەرمووی: ((من کذب عليّ متعمّداً فليتبوّأ مقعده من النار))[١] واتە: هەچ کەسێك بە ئەنقەست درۆم پێوە هەڵبەستێت، با جێگاکەی خۆی لە دۆزەخدا خۆش بکات.

١٦ـ لە (عومەیری کوڕی هانیئ)ەوە، وتی: لەسەر ئەم مینبەرە گوێم لە (معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان) بوو، دەیوت: گوێم لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بوو، دەیفەرموو: ((لا تزال طائفة من أمتي قائمة بأمر الله، لايضرهم من خذلهم أو خالفهم حتى يأتي أمر الله عزوجل وهم ظاهرون على الناس)) واتە: بەردەوام کۆمەڵێك لە ئوممەتی من فەرمانی خودا (لە جیهادو زانست‌و فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپەو بەندایەتی‌و هەموو کارێکی خێر) بەرپا دەکەن، ئەوانەی دەیانەوێت زەبوونیان بکەن یان دژیان بوەستن زیانیان پێ ناگەیەنن، ئەوان تا ئەو ڕۆژەی فەرمانی خودا -بۆ وێرانبوونی دنیا- دێت بەسەر خەڵك (ی کافر)دا سەرکەوتوون. (مالیکی کوڕی یخامری سکسکی) هەستاو وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران گوێم لە (موعازی کوڕی جەبەل) بوو دەیوت: ئەوانە خەڵکی (شام)ن، معاویەش بە دەنگی بەرز وتی: ئەوە (مالیك)ەو پێی وایە کە گوێی لە (موعاز) بووە کە دەڵێت: ئەوانە خەڵکی (شام)ن.[٢]

١٧ـ (ڕوح) قسەی بۆ کردین‌و وتی: (ئەبو ئومەییە عەمرووی کوڕی یەحیای کوڕی سەعید) قسەی بۆ کردین‌و وتی: گوێم لە باپیرم بوو قسەی دەکردو دەیوت: کە (معاویە) دوابەدوای (ئەبی هورەیرە) مەسینە ئاوەکەی هەڵگرت‌و بەدوای پێغەمبەر (ﷺ)دا ڕۆیشت، (أبو هريرة) شکایەتی کرد، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) دەستنوێژی هەڵدەگرت جارێك یان دووجار سەری بۆ لا بەرزکردەوە فەرمووی: ((يا معاوية، إذا وليتَ أمراً فاتّق الله عزَّ وجلّ وأعدل)) واتە: ئەی معاویە! ئەگەر کاتێك پۆستێکی دەسەلاتت کەوتەدەست پارێز لە خودای بەرزو مەزن بکەو دادگەربە، (معاویە) وتی: هەمیشە فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ)م لەبەرچاو بووو پێم وابوو

---

١ المصدر نفسه (١١٨/٢٨)، صحيح لغيره.

٢ المصدر نفسه (١٢٩/٢٨)، إسناده صحيح.

لە تاقیکردنەوەی کارێکدام، تا کاتێك بینیم -بەم پۆستەوە- گیرۆدە بووم و کەوتمە نێو ئەم تاقیکردنەوە قورسەوە.[١]

١٨ـ لە (ئەبی عامر عبدالله ی کوڕی لوحەی)یەوە، وتی: لەگەڵ (معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان)دا (حەج)مان کرد، کاتێك گەیشتینە (مەککە)و، لە بەرپاکردنی نوێژی نیوەڕۆ بۆوە، هەستایە سەرپێو وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((إن أهل الكتابَين إفترقوا في دينهم على ثِنتَين وسبعين ملّةً وإنَّ هذه الأُمَّة ستفترق على ثلاث وسبعين مِلّةً (يعني الأهـواء) كلُّها في النار إلاّ واحدةً، وهي الجماعةُ وإنَّه سَيَخرج من أُمتي أقوامٌ تجارى بهم تلك الأهواء كَما يتجارى الكلبُ بصاحبِه لا يبقى منهُ عرقٌ ولا مفصلٌ إلاّ دخَلَهُ، والله يا معشَرَ العرب! لَئن لم تقوموا بِما جاءِ به نبيُّكم (ﷺ) لَغَيرُكُم مِنَ النَّاس أحرى أن لايقوم بـه))[٢] واتـە: هـەردووك خـاوەن کتێـب (واتە جوولەکەو نەسرانی) سەبارەت بە (دین)ەکەیان بوون بە (٧٢) فیرقە ،ئـەم ئوممەتـە -ی ئیسلامە کە هەموو خەڵکانی سەر گۆی زەوی دەگرێتەوە لە دوای هـاتنی پێغەمبـەر (ﷺ) تـا ڕۆژی دوایـی- دەبێتـە (٧٣) فیرقـە ، بـێ لـە یـەکێکیان کـە (جەماعـەت)ە، دەنـا هـەر هەموویان دەچنە ئاگری دۆزەخەوە، لەمەولا خەڵکانێك لە ئوممـەتی مـن پەیـدا دەبـن، چۆن هاری (کە بە هۆی گازی سەگەوە تووشی مرۆڤ دەبێت) تەشەنە دەکات بۆ هەموو جەستەی بابای سەگگەستوو تا بە تـەواوی دەمـارو جومگەکانیـشی ڕادەگـات، ئـاواش دەردی بیدعـەو هەواپەرسـتی -وەك ئـەم ڤایرۆسـی هاریـە- تەشـەنە دەکـات بۆیـان و هـەموو لایـەکیان دەگرێتەوە، وەڵڵاهی! ئەی گەلی عەرەب! ئەگەر ئێوە ئەو (قورئان)ەی بـە پێغەمبەرەکەتانـدا (ﷺ) نێردراوە بەرپا نەکەنو کاری پێ نەکەن ئەوا خەڵکی دیکەی ناعەرەب لـە پێـشترن لـە ئێوە بۆ ڕانەپەڕاندنی -واتە ئەگەر ئێوە ئەم ئەرکە ڕانەپەڕێنن چ گلەییەك لە ئـەوان دەکـرێ ڕاینەپەڕێنن!-.

---

١ المصدر نفسه (١٣٠/٢٨)، گێڕەرەوەکان جێی (ثقة= متمانە)ن، بەڵام (سعیدی کـوڕی عمـروی کـوڕی سـعیدی کوڕی عاص)ی باپیری (عمروی کوڕی یەحیا) بۆی دەرنەخستووین کە گوێی لـە (معاویـە) بووبێـت، بوخـاری لـە (تـاريخ الكـبير)دا لـە (٣٣١/٣)دا دەڵێـت: هەنـدێك ڕیوایـەتی لاواز لـە تـاريخی معاویـەدا هـاتوون، ئـەمجا ئـەم (حدیث)ەش دەهێنێتە نێویانەوە.

٢ الموسوعة الحديثية، مسند الامام أحمد (١٣٥/٢٨)، إسناده حسن.

## هەشتەم: ژمارەیەك لەو بەناو فەرموودانەی شایستەی کەسایەتی (معاویە) نین چ مەتح‌و پێهەڵگوتن بن، چ زەمب‌و تانەو تەشەرلێدان بن:

١ـ ژمارەیەك لەو بەناو فەرموودانەی بۆ مەتحی (معاويە) ڕەوانین:

(أبن عساكر) لە باسی معاویەدا ژمارەیەك بەناو فەرموودەی لاوازو هەڵبەستراوی هێناون‌و درێژدادڕی پێ کردوون‌و تێکەڵ‌و پێکەڵ‌و دژ بە یەکن.[1]

أـ لە (وائیلە)وە بە (مەرفوعی): ((كادّ معاوية أن يبعث نبياً، من حلمه وإئتمانه على كلام ربي))[2] واتە: (معاويە) بە هۆی هۆشمەندی‌و ئەمینداریەکەی لە بەرانبەر کەلامی پەروەردگاردا خەریکە بکرێتە پێغەمبەرو پەیامی خودای پێدا بنێردرێت.

بـ لە (ئەبی موسا)وە: وەحی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) هات، کاتێك ڕاز (ی وەحی)ەکەی بۆ دەرکەوت، داوای معاویەی کرد، کاتێك (معاویە) (آية الكرسي) نوسیەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((غفر الله لك يا (معاوية) ما تقدم الى يوم القيامة))[3] واتە: ئەی معاویە! خودا لە هەموو گوناهەکانت خۆش بوو کە تا قیامەت دەیانکەی.

تـ لە (ئەنەس)ەوە: جبریل دابەزی‌و قەڵەمێکی زێڕی هێنا، وتی: ئەی محمد خودای بەرزی بالا دەست دەفەرموێت: ((قَد أهدَيتُ هذا القلم من فوق عرشي الى معاوية، فمُره أن يكتب آية الكرسي به ويشكله ويعجمه))[4] واتە: ئەم قەڵەمەم لەسەر عەرشی خۆمەوە بە دیاری دەدەمە معاویە، پێی بڵێ (ئایەتولکورسی) جارێك بە سەرو بۆرو نوختەوەو جارێکی تر بێ سەرو بۆرو نوختەی پێ بنووسێتەوە، بێ لەمەش (جبریل) هەواڵی زۆر دووردرێژی باسکردن.

ثـ لە ئیبنو عەباسەوە وتی: کاتێك (آية الكرسي) دابەزێنرا، پێغەمبەر (ﷺ) داوای معاویەی کرد (تا بینوسێتەوە)، (معاویە) قەڵەمی دەست نەکەوت، لەبەر ئەوە خودا فەرمانی بە (جبریل) کرد قەڵەمێك لەنێو قوتوی مەرەکەبەکەی هەڵگرێت‌و بۆی ببات، (معاویە) هەستا بچێت قەڵەمێك بێنێت، جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((خُذِ القلم من أُذنك)) ئەم قەڵەمە بگرە لە پەنا گوێتە.

---

١ سير أعلام النبلاء (٣/٢٢٧، ١٢٨).
٢ المصدر نفسه (٣/١٢٨) موضوع.
٣ المصدر نفسه (٣/١٢٩) موضوع.
٤ المصدر نفسه (٣/١٢٩) موضوع.

کە تەماشا دەکات قەڵەمێکە ئەمەی لەسەر نووسراوە:

(لا الـه الا الله، هدیـة مـن الله الی أمینـه معاویـة). واتـە: دیاریەکـە لـە لای خـوداوە بـۆ ئەمیندارەکەی خۆی (معاویە).

ج- لە (حوزەیفە)وە بە مەرفوعی: ((یبعث (معاویة) وعلیه رِداءٌ مـن نـور الایمـان))[1] واتـە: (معاویە) زیندوودەکرێتەوەو کراسێکی لە نووری ئیمانی لەبەرە.

ح- لە (ئەنەس)ەوە بە مەرفوعی: ((لا أفتقدُ أحداً غیر معاویة، لا أراه سـبعین عامـا، فـإذا کان بعد أقبل علی ناقة من مسك، فأقول: أین کنتَ؟ فیقـول: في روضـة تحـت العـرش)) واتـە: کەسم لێ بزر نابێت جگە لە معاویە، تا (٧٠) ساڵ نایبینمەوە، دوایی بە سواری وشـترێکی لـە (میسك) دروستکراو دێت و پێشواری لێ دەکەم، جا دەڵێم: لـە کـوێ بـووی؟ دەڵێـت: لـە ژێـر عەرش لەنێو باخێکدا بووم.

س- لە (عبدالله ی کـوڕی عومـەر)ەوە بـە مـەرفوعی: ((یـا معاویـة، أنـت مـني وأنـا منـك، لتزاحمني علی باب الجنة))[2] واتـە: ئـەی معاویـە، تـۆ لـە منـی و مـن لـە تـۆم، لەبـەر دەرگـای بەهەشت شان لە شانم دەدەی.

(ذهبي) پاش هێنانی ئەم ڕیوایەتانەو چەند ڕیوایەتێکی تر، دەڵێت: ئەم بەناو فەرموودانە دیارە کە هەڵبەستراون، خودا چاکتر دەزانێت.[3]

(الشوکاني) زۆربەی ئـەم بـەناو فەرموودانـەی لـە کتێبـی (الفوائـد المجموعـة في الأحادیـث الموضوعة)دا هێناون[4] (واتە تەواو بە هەڵبەستراوی داناون).

(إبن کثیر) پاش هێنـانی یـەك لـەم بـەناو فەرموودانـە دەڵێـت: (ابـن عـساکر) زۆرێـك لـەم ڕیوایەتە هەڵبەستراوانەی هێناون،[5] بەڵام ئەوەی جێی سەرسـوڕمانە ئەوەیـە کـە ئـەو لەگـەڵ ئەو هـەموو دەرخکـردن و ئاگاداریـەی بـە فـەرموودەکان، چـۆن دەبێـت ئامـاژە بـە بێـزۆکی و پوچەڵی و لاوازی حاڵی ئەم ڕیوایەتانە نەکات و خەڵکیان لێ ئاگادار نەکاتەوە؟!!.[6]

---

١ المصدر نفسه (٣/١٣٠) موضوع.

٢ المصدر نفسه (٣/١٣١) موضوع.

٣ المصدر نفسه (٣/١٣١).

٤ الفوائد المجموعة (ص:٤٠٣-٤٠٧).

٥ البدایة والنهایة (١١/٤٠٩).

٦ سیر أعلام النبلاء (٣/١٣١).

**٢ـ ژمارەیەك لەو بەناو فەرمودانەی سەبارەت بە زەمبی (معاویە) هەڵبەستراون:**

(إبن الجوزي) دەڵێت: خەڵکانێك کە هەر بە ناو خۆیان بە (ئەهلی سوننە)وە هەڵواسیوە، دەمارگیرییان بۆ (معاویە) نواندووە، هاتوون بەناو فەرموودەی زۆریان سەبارەت بە ڕێزداری‌و شکۆمەندی ئەو داناون، خەڵکانێکی (ڕافیزە)ش دەماریان گرژ بووەو ڕقیان لە (معاویە) هەستاوەو بەناو فەرموودەیان سەبارەت بە زەمبی ئەو هەڵبەستوون، بێگومان هەردووك فیرقە کەوتوونەتە چاڵی هەڵەی قێزەونەوە.[١] لەو ڕیوایەتە نامۆو هەڵبەستراوانەی زەمبی (معاویە) دەکەن:

ئەم ڕیوایەتەیە کە خراوەتە پاڵ پێغەمبەری خودا (ﷺ): ((يطلع عليكم رجل يموت على غير سنتي)) واتە: ئێستا پیاوێك بەسەرتاندا دێت لەسەر غەیری سوننەتی من دەمرێت، پێغەمبەر (ﷺ) هەستایە سەرپێ‌و دەستی بە وتاردان کرد، (معاویە) دەستی (یەزید)ی گرت‌و دەرچووو گوێی لە وتارەکە نەگرت، جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((لعن الله القائد والمقود)) واتە: لەعنەتی خودا لە سەرکردەو شوێنکەوتوو بێت)، واتە: ڕۆژێك دێت (معاویە) دەبێتە سرکردەو لەگەڵ ئوممەت خراپ دەبێت.

ئەم ڕیوایەتە ڕاست نیەو درۆیەو بە دەم پێغەمبەر (ﷺ)ەوە هەڵبەستراوە، بە یەکدەنگی زانایانی ئەهلی (حەدیس)، درۆیەو دانراوە، ئەمە لە سەرچاوە باوەڕپێکراوەکانی (حديث)دا بوونی نیەو هیچ سەنەدێکی ناسراوی نیە.[٢] وەکو لە ژیاننامەی (معاویە)شدا دەخوێنرێتەوەو دەزانرێت، ئەو لە ڕیزی ئەو کەسانە بوو کە زۆر حەلیم‌و ئاقڵ بوون‌و لە بەرانبەر کەسانێك ئازاریان دەدان ئارام‌و بارقوڵ بوون، تا بەوەڕادەگات، لە بەرانبەر ناحەزەکانیشیاندا هۆگرو بە لوتف‌و سەرنجڕاکێش بوون، جا کەسێك ئەمە ڕەوشتی بووبێت، چۆن‌و بە چ بەڵگەیەك پشت لە پێغەمبەرێك (ﷺ) دەکات‌و خۆی لێ دوورەپەرێز دەکات کە گەورەترین پلەوپایەی هەیە لە دین‌و دنیاداو لە هەموو ئیش‌و کارێکیدا پێویستی پێی دەبێت؟ ،جا چۆن لە کۆڕەکەیدا ئارام ناگرێت‌و گوێی بۆ ڕاناگرێت، کە لە کاتێکدا (ئەو پاش ئەوە بوو بە دەسەڵاتدار گوێی لە کەسێك ڕادەگریت کە بەرەو ڕوو جنێوی پێ دەدات، باشە لەبەرچی گوێ بۆ فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) شل ناکات؟ ، باشە مادام کەسێکی ئاوا نەفرین لێکراو

---

١ الموضوعات (١٥/٢).

٢ البداية والنهاية (٤٣٨/١١).

بێت! چۆنو لەبەرچی پێغەمبەر (ﷺ) دەیکاتە کاتبی بەردەستی خۆیو (وەحی) پێ دەنووسێتەوە؟)[١].

**٣ــ ڕۆڵگێڕانی (بەنی ئومەییە) لە سەردەمی پێغەمبەری خودادا (ﷺ):**

لەگەڵ ئەوەدا زۆرینەی پیاوانی (بەنی ئومەییە) لە سەرەتای بانگەوازدا موسڵمان بوونو قوربانیان داو بەرەو (حەبەشە) کۆچیان کرد، هەروەها لەگەڵ ئەمەدا تەواوی خێڵی (بەنی ئومەییە) لە کاتی فەتحی مەککەدا موسڵمان بوونو پێغەمبەر (ﷺ) پێشوازی لێکردنو بە موسڵمان بوونیان شادومان بوور لە ئەنجامدانی کارە گەورەکاندا پشتی پێ بەستنو، بە خاتری سوود وەرگرتن لە هەوڵو تەقەلاو تواناکانیان پێگەیەکی فراوانی لە دەوڵەتەکەیدا پێ بەخشین. ئەمەو پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕۆژی فەتحی (مەککە)دا کاتێك فەرمووی: ((من دخل دار أبي سفيان فهو آمن))[٢] واتە: هەر کەسێك بچێتە ماڵی ئەبی سوفیان پەنای دراوە، ئیمتیازاتێکی وای بە (ئەبو سوفیان)دا کە بە کەسی دیکەی دانیشتوانی مەککەی نەدا، ئەم شەرەفە گەورەی (ئەبو سوفیان) پێی درا، دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) ڕێزی لە سەرۆکو قسە بەدەستانی هۆزەکان ناوەو حیسابی تایبەتی بۆ کردوون، وەك دەبینین پێغەمبەر (ﷺ) ئەبو سوفیانی کرد بە کاریەدەست بەسەر (نەجران)ەوەو (معاویە)ی کوڕیشی کردە (کاتب)ی خۆی.[٣]

(موسلیم) لە (صحیح)ەکەیدا لە (إبن عباس)ەوە دەگێڕێتەوە، کە (ئەبو سوفیان) داوای لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد پلەی سەرکردەیی (سەربازی) پێ ببەخشێت تا بتوانێت جەنگ لەگەڵ کافراندا بکات چۆن تا ئێستا جەنگی لەگەڵ موسڵمانان دەکرد، هەروەها (معاویە)ی کوڕیشی بکاتە (کاتب)ی بەردەستی خۆی، جا پێغەمبەر (ﷺ) داواکەی لێ وەرگرت.[٤]

یەکەمین والی شاری مەککە دوای فەتحکرانی پیاوێکی ئومەوی بوو بە ناوی (عوتابی کوڕی ئوسەیدی کوڕی ئەبیلعەیسی کوڕی ئومەییەی کوڕی عەبدشەمس).

(إبن إسحاق) لە (زەیدی کوڕی ئەسلەم)ەوە دەگێڕێتەوە: کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) (عوتابی کوڕی ئوسەید)ی کردە والی مەککە ڕۆژانە درهەمێکی بۆ بڕیەوە، عوتاب وتی ئەی خەڵکینە، دەك خودا ئەو کەسە برسی بکات کە (ڕۆژانە) بە درهەمێك تێر نابێت، پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژانە

---

١ أمير المؤمنين (معاوية) لإبن تيمية، جمع وتقديم محمد مال الله (ص: ٨٨).

٢ البخاري، رقم (٤٢٨٠).

٣ العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ١١).

٤ صحيح مسلم بشرح النووي (٦٢/١٦).

(درهەم)ێکی بۆ بڕیومەوە، من ئێستا پێویستیم بە (کۆمەکی) کەس نیە،[١] بە هەمان شێوە پێغەمبەر (ﷺ) (عەمروی کوڕی سەعیدی کوڕی عاسی کوڕی ئومەییە)ی کردە کاربەدەستی ئاوەدانیەکانی (خەیبەر، وادیلقورا، تەیما، تەبوك)، کە پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی دوایی کرد، (عەمرو) لەسەر ئەم کارەی بەردەوام بوو.[٢] هەروەها (حەکەمی کوڕی سەعیدی کوڕی عاس)ی کردە سەرپەرشتیاری بازاڕی (مەککە)[٣]و، (خالدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاس)یشی بەسەر (سەنعا)وە دانا،[٤] (ئەبانی کوڕی سەعیدی کوڕی عاس)یشی بەسەر (بەحرەین)ەوە دانا، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی فەرموو ئەمانە هەموویان لەسەر ئەم پۆستانەیان بەردەوام بوون،[٥] زیاد لەمەش ئەبانو خالد)ی جووتە کوڕی (سەعیدی کوڕی عاس)و (معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان)و لە سەرووی ئەمانیشەوە (عوسمانی کوڕی عەففان) (خودا لێیان ڕازی بێت) لە ڕیزی کاتبانی پێغەمبەر (ﷺ) بوون.[٦]

پوختەی قسە: پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی فەرموو زۆرینەی پیاوانی (بەنی ئومەییە) پۆستی جۆراوجۆر (ی دەوڵەت)یان بە دەستەوە بوون لە (ویلایەت، کیتابەت، دارایی)، نەشمانزانیوە یەك تیرەی تر لەنێو تیرەکانی (قورەیش)دا بە ئەندازەی تیرەی (بەنی ئومەییە) لە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) کاربەدەستی هەبووبن.[٧]

بەکارهێنانی زۆرینەی پیاوانی (بەنی ئومەییە) لە کاروباری دەوڵەتدا (لە لایەن پێغەمبەر (ﷺ)ەوە)، گەورەترین بەڵگەیە لەسەر هەڵکەوتوویی‌و لێهاتوویی‌و ئەمینداری پیاوانی ئەم تیرەیە.[٨]

بەڵام سەبارەت بەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) کە ڕووبەڕووی دانیشتوانی شاری مەککەو دوای فەتحکرانی فەرمووی: ((إذهبوا وأنتم الطلقاء))[٩] واتە: بڕۆن ئێوە ئازادن. خەڵکانێك هاتوونو ئەم چەندوشانە دەکەن بە خاڵێکی ڕەشو بە تەنها بە نێوچاوان

---

١ السيرة النبوية لإبن هشام (٤/٦٩ـ١٤٩)، تاريخ خليفة بن خياط (ص: ٩٧).
٢ منهاج السنة (٣/١٧٥ـ١٧٦).
٣ المصدر نفسه (٣/١٧٥ـ١٧٦).
٤ خليفة بن خياط (ص: ٩٧).
٥ منهاج السنة (٣/١٧٥ـ١٧٦).
٦ تخريج الدلالات السمعية (ص: ١٥٩ـ١٥٢).
٧ منهاج السنة (٣/١٧٥)، العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ١٢).
٨ العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ١٢).
٩ الطبقات (٢/١٤١ـ١٤٢).

(تـەویل)ی (بـەنی ئومەییـە)وە دەنوسـێنن‌و خۆیـان‌و ڕۆڵـەکانیان بـە (تولـەقا)و ڕۆڵـەکانی (تولەقا) عەیبدار دەکەن، لـەوە تێنەگەیشتوون کە ئـەم (ئـازاد)انـەو ڕۆڵـەکانیان بەڕاسـت‌و دروستی ئیسلام بوون‌و هەر لەسـەردەمی پێغەمبـەر (ﷺ) تـا دوای وەفاتیشی لەسـەردەمی خەلیفە ڕاشیدەکاندا خاوەنی هەڵوێستی گەورەو بەرچاوی زۆر بوون لە سەرخستنی ئیسلام‌و ئەنجامدانی فتوحاتدا.[1]

حەز دەکەین ئاماژە بە چەند خاڵێکی پەیوەست بە وەسفی (تولەقا) بکەین:

١ـ ئەم تۆمەتە دەرهاویشتەی سـەردەمی بەربـەرەکانیێ‌و تـاقم تاقمێنـە بـوو، واتـە کـاتی تەقینـەوەی گڕکـانی ڕق‌و قـین لـە دژی (بـەنی ئومەییـە) لـە دوارۆژەکـانی سـەردەمی (عوسمان)ەوە (خودا لێی ڕازی بێت)و دوای دەرکەوتنی ئەستێرەی (معاویـە)ی کـوڕی ئـەبی سوفیان‌و سەرهەڵدانی ناکۆکی نێوان ئەوو (عەلی کوڕی ئـەبوتالیب) (خـودا لێـی ڕازی بێـت)، ئەم وەسفە لە لایەن ناحەزانیانەوە بەو واتایـە دەهـات کـە گوایـە (بـەنی ئومەییـە) ئیمانیـان لاوازەو لـە خۆشـی دەسـتکەوتەکان‌و ترسـی کوشـتن‌و بـە خـاتری فێڵکـردن لـە ئیـسلام‌و ئەهلەکەی‌و سودمەندبوونی خۆیان لەو نێوەدا هاتوونەتە نێو (ئیسلام)ەوە.

٢ـ ئەگەر بێتو بەو واتا پڕ وردەکاریەی ڕابوری سەبارەت بـەم وشـەیە (الطلقـاء) تەماشـا بکەین، ئەوا (ئـەبو سـوفیانی کـوڕی حـەرب)و (معاویـە)ی کـوڕی لـەنێو (تولـەقا)دا نـابینین، چونکە ئەبو سوفیان بە کەمێك پێش فەتحکرانی مەککە موسڵمان بـوو، ئـەو کاتـە پێغەمبـەر (ﷺ)و سوپاکەی لە (مر الظهران)ی دەرەوەی شاری مەککە بوون، هـەر کـە موسـڵمان بـوو، خێرا هاتەوە نێو مەککەو داوای لە هۆزەکەی دەکرد ئاشتی بکەن‌و پێشوازی لە واقعـی فـەتح بکەن، سەبارەت بە (معاویە)ی کوڕیشی، ژمارەیە ڕیوایەت جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە ئەویش پێش (فەتح) موسڵمان بووە، بەڵام ئیسلامەتیەکەی خـۆی دەشاردەوە، ئەمـە جگـە لەو حاڵە تایبەتیەی کە باوکی خاوەنی پلەو پۆستی سەرکردایەتی سەربازی بووو جەنگی لـە دژی موسڵمانان دەکرد، لە ڕیوایەتێکدا بە دەمی خۆی دەڵێـت: کـە ئـەو لـە ڕۆژی (عـەمرەی قەزا) یان کاتی (سوڵحی حودەیبیە) بە نهێنی موسـڵمان بـووە،[2] مێژوونوسـان تـەنها لەبـەر سێ هۆ ئەوانیان خستۆتە نێو جـوغزی (تولـەقا)وە، یەکـەمیان: چـونکە کـاتی ئیـسلامبوونی (ئـەبو سـوفیان) لـە کـاتی فـەتح نزیـك بـوو، دووەمیـان: ئیـسلامبوونی (ئـەبو سـوفیان) و

---

١ العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ٨).

٢ البداية والنهاية (٣٩٦/١١).

ئیسلامبوونی خەڵکی مەککەیان بە یەکەوە بەستۆتەوە، چونکە ئەو کاتە (ئەبو سوفیان) سەرۆکی مەککە بوو، سێهەم: ئیسلام بوونی (معاویە) بە نهێنی بڵاو نەبووەوە، وەکو دەبینین ئەو لەگەڵ (توڵەقا) واتە خەڵکی مەککەو لە کاتی فەتحدا ئیسلام بوونەوەکەی بیسرا.

٣ـ شۆڕەتی (توڵەقا= ئازادان) وەسفی زەمب‌و خراپی لێ نافامرێتەوە، بەڵکو (توڵەقا) موسڵمان بووانی (فەتح)ن، ئەو کەسانەن لە کاتی فەتحی (مەککە)دا موسڵمان بوون‌و پێغەمبەر (ﷺ) ئازادی کردن، ژمارەیان نزیکەی (٢٠٠٠) هەزار کەس دەبوو، هەر لەنێو ئەمانەدا چاکترین موسڵمان‌و گەورەترین کەسایەتی هەڵکەوتن‌و دەرکەوتن وەکو: (حارثی کوڕی هوشام، سوهەیلی کوڕی عەمرو، سەفوانی کوڕی ئومەییە، عیکریمەی کوڕی ئەبی جەهل، یەزیدی کوڕی ئەبی سوفیان، حەکیمی کوڕی حزام، ئەبو سوفیانی کوڕی حارثی ئامۆزای پێغەمبەر (ﷺ) کە پێشدا قسەی بەدی ئاراستەی پێغەمبەر دەکردن، بەڵام دوایی موسڵمانێکی باشی لێ دروست بوو، عەتابی کوڕی ئەسید کە پێغەمبەر (ﷺ) دوای فەتح، کردی بە بەڕێوەبەری (مەککە)، ژمارەیەکی زۆری دیکەی بێ لەمانەش).

٤ـ تێڕوانینی ئیسلام بۆ ئەمە: ئیسلام پێش خۆی دەسرێتەوە، دەرگای خۆی دەخاتە سەرپەرشت‌و دەرفەت بە هەموو کەس دەدات تا هەموو وزەو تواناکانی بە گەڕ بخات‌و بەرەو بەدیهێنانی ئامانجە مەزنەکانی بەرەو پێشی بەرێت، یەکەیەکەی خەڵك بەپێی لێهاتووییان لە جێگای شیاوی خۆیان دادەنێت‌و، (باوەڕی وایە) هەر کاتێك باشترین خەڵکانی سەردەمی (جاهیلی) تێگەیشتن دەبنە باشترین خەڵکانی (ئیسلام)، درەنگ موسڵمان بوونی (خالیدو عەمروی کوڕی عاص) نەبوو بە ئاستەنگ لە ڕێی وەرگرتنی جێگەو پێگەی بەرزیان لە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)دا، پێغەمبەر (ﷺ) (عەمرو)ی کردە فەرماندەی سوپاکەی جەنگی (ذات السلاسل)، نازناوی (سیف الله- شمشێری خودا)شی بە (خالید) بەخشی،... ئەمە وێڕای پاراستنی ئەو پلەو پایە بەرزو مەزنانەی کە بە پێشەنگانی ڕاستگۆی کاروانی ئیسلام بەخشرابوون، لە ڕیزی پێشەنگی ڕاستگۆدا ژمارەیەکی زۆرو بەرچاوی تیرەی (بەنی ئومەییە) هەبوون، چۆن ژمارەیەك لە ئەوان‌و غەیری تیرەکەی ئەوانیش لەنێو ڕیزی (توڵەقا)دا هەبوون.[1]

---

١ الدولة الاموية المفترى عليها (ص: ١٤٤).

## باسی دووەم
## ( ئومەویەکانو معاویە ) لە سەردەمی ئەبو بەکرو عومەرو عوسماندا ( خودا لێیان ڕازی بێت )

### یەکەم: لە ماوەی خیلافەتی ئەبو بەکردا ( خودا لێی ڕازی بێت ):

موسڵمانەکان پاش مەرگی پێغەمبەرەکەیان (ﷺ) ڕووبەڕووی بارودۆخگەلێکی توندو تیژ بوونەوە، بە کۆڕاو یەکدەنگی بڕیاریاندا وەکو (خەلیفەی پێغەمبەری خودا ـﷺـ) بەیعەت بە (ئەبوبەکر) بدەن، (ئەبوبەکر) هەوڵو تەقەلایەکی زۆری لە بەرامبەر بەگژداچوونەوەی خەتەرە سەرهەڵداوەکان بەخشی، جەنگی لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان کردو وازی لێ نەهێنان تا هێنانیەوە نێو جوغزی ئیسلامو گرۆهی موسڵمانان، بزووتنەوەی (فتوحات) لە وڵاتانی (فارسو ڕۆم) دستی پێکرا، یەکەمین نامەی ئەبوبەکر -کە سەبارەت بە جەنگی هەڵگەڕاوەکان نوسیبووی) ئاڕاستەی (عوتابی کوڕی ئەسید)ی (والی) مەککەی کرد- کە ئەندامێکی بنەماڵەی ئومەوی بوو، بۆی نوسیبوو بە خۆیو ئەوانەی لەسەر ئیسلام ماونەتەوە هێرش بکاتە سەر ئەوانەی لە بازنەی ویلایەتەکەیدا لە ئیسلام هەڵگەڕاونەتەوە، ئەمەو (عوتاب) لە (توهامە) بەرەنگاریان بۆوەو بەسەریاندا زاڵ بوو.[1] سوپایەکی (٥٠٠) نەفەری بە فەرماندەیی (خالیدی کوڕی ئەسید)ی برای لە دانیشتوانی مەککەو ئاوەدانیەکانی دەوروبەری بەشداری جەنگی هەڵگەڕاوەکانی (یەمەن)ی کرد.[2] لە گێڕانەوەی دانیشتوانی (حەزرەمۆتو کیندە)دا بۆ نێو باوەشی ئاینی ئیسلام ڕۆڵی بەرچاوی گێڕا.[3] خالیدی کوڕی وەلید)یش سەرکردایەتی ئەو سوپایەی کرد کە لە دژی (موسەیلەمەی کەززاب) جەنگاو، خالید (ئەبو حوزەیفەی کوڕی عوتبەی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی عەبدشەمس)ی کردە فەرماندەی سوپای (موهاجیران)و (زەیدی کوڕی خەتتاب)یشی لەگەڵ دانا،[4] ئەمەو (ئەبو حوزەیفە) جەنگێکی جوامێرانەی ئەنجام دا، کە موسڵمانەکان لە سەرەتادا پەشۆکان، (ئەبو

١ تاريخ الطبري (٣/٣١٩)، الدولة الاموية المفترى عليها (ص: ١٤٨).
٢ تاريخ الطبري (٣/٣٢٢، ٣٢٩، ٣٣٠).
٣ المصدر نفسه (٣/٣٣٠-٣٤٢).
٤ المصدر نفسه (٣/٣٨١).

حوزەیفە) هوتافی دەکێشاو دەیوت: هۆ ئـەهلی قورئـان! قورئـان بـە چـالاکیەکانتان جـوان بکەن)، تا نەکوژرا لە شەڕو کوشتار نەکشایەوە (خودا لێی ڕازی بێت).[١]

هەر لەو ڕۆژەدا (سالم)ی خزمەتکاری (ئەبو حوزەیفە) ئالاهـەڵگری سـوپای (موهـاجیران) بوو، ئەویش تا نەکوژرا کۆڵی نەدا لە کوشتار،[٢] (معاویـە)ش (خـودا لێـی ڕازی بێـت) لـە دژی موسـەیلەمە بەشـداری جەنگـەکانی (یەمامـە)ی کـرد،[٣] بـە هـەمان شـێوە (عوکاشـەی کـوڕی محصنی ئەسەدی)ی هاوپەیمانی (بەنی ئومەییـە) ئامـادەی جـەنگی گـەڵ (طلیحـة الأسـدي) بوو،[٤] هەروەها (عەلائی حەزرەمی)ی هاوپەیمانیان بەشـداری سـەرکوتکردنی هەڵگـەڕاوەکانی (بەحرێن)ی کردو کارێکی بەسـەرهێنان کـە جێـی تێڕامـان‌و سەرسـوڕمان بێـت‌و بەسـەریاندا زاڵبوو.[٥] دوابەدوای کۆتایی هاتنی جەنگ‌و گەڕانەوەی هەڵگەڕاوەکان بـۆ نێـو ئـامێزی ئـایین‌و ملکەچـبوونیان بـۆ حکومـەتی ڕاشـیدە، شـتێکی سروشـتی‌و ئاسـایی بـوو لایـەك بـە لای ڕزگارکردنی گەلـە چەوسـێنراوەکانی ژێـر چـەپەڵۆکی حوکومـەتی سـتەمکاران دا بکرێتـەوەو بانگهێـشت بکـرێن بـۆ ئیـسلام ، وەکـو لـە مێـژوودا ناسـێنراوە ، (بزووتنـەوەی فتوحـاتی ئیسلامی) لە هەردوو بەرەی فارس (ئێـران)و ڕۆم دەسـتی پێکـرد، (بـەنی ئومەییـە) ڕۆڵێکـی کاریگەرو بەرچاوی وایان لەم جەنگانەدا گێڕا، کە تەئکید لەسەر پابەندبوونی ئیسلامیانەیان‌و زیندووبوونی ڕۆڵی مێژووییانەیان لەو سەردەمەدا دەکاتەوە، ئێمە لە سەرەتادا تـەنها ئامـاژە بە دوو نیشانەی دیاری خاوەنانی بزووتنەوەی (فتوحات) دەکەین.[٦]

نیشانەی یەکەم: بە گەورەو گرنگ دانانی ڕۆڵی موسڵمانانی (فـەتح)و (توڵـەقا)ی مەککـە کە ژمارەیەك خەڵکی بەنی ئومەییەشی تێدا بوون لە بزووتنـەوەی (فتوحـات)دا، ئەمـە لەبـەر دوو هۆ چاوەڕوان دەکرا: یەکەم: (ئەبوبەکر) بڕیاری دابـوو پـشت بەوانـە نەبەسـتێت کـە لـە ئیسلام هەڵگەڕاونەتەوە، بەڵام لە کاتی فتوحاتدا بڕیارەکـەی هەڵدەوەشـێنێتەوە،[٧] ئەمـە بـۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە (ئەبو بەکری صـدیق) (خـودا لێـی ڕازی بێـت) پێـداگیری لەسـەر پـاك‌و

١ المصدر نفسه (٣/٢٩١).
٢ المصدر نفسه (٣/٢٩١_٢٩٢)، الدولة الاموية المفترى عليها (ص: ١٤٨).
٣ البداية والنهاية (١١/٣٩٦).
٤ ديوان الردة للعتوم (ص: ٨٦).
٥ تاريخ الطبري (٣/٣٠١_٣١٣)، سيرة أبي بكر الصديق، للصلابي (ص: ٢٢٥).
٦ الدولة الاموية المفترى عليها (ص: ١٤٨).
٧ تاريخ الطبري (٣/٣١٩_٣٤٧).

پوختی (فتوحات) دەکردەوەو حەزی نەدەکرد ئاسەواری خەڵکانی کەمدینو هەوەسبازو دنیاپەرستی پێوە دیاربێتو دەرەنجام بە پاكو خاوێنی بۆ ئیسلام نەبێت، یان بەڵگەی ئیسلامی بوونی پێوە دیار نەبێت. دووەم: دەگەڕێتەوە بۆ پێداگیری ئەو گەورەو پیاوماقوڵانەی موسڵمانانی فەتحو توڵەقای مەککە لەسەر قەرەبووکردنەوەی ئەو ماوە دوورو درێژەی لە خزمەتی بانگەوازی ئیسلامدا لە دەستیان چووەو لەو ڕێگایەوە بتوانن خۆیان بگەیەننەوە بە کاروانی ئەو برایانەیان کە لە ئیسلام بووندا پێشیان کەوتوونو پلەو پایەی (دنیاو قیامەت)یان زۆر بەرز بووەتەوە.[1]

نیشانەی دووەم: چڕبوونەوەی چالاکی ئومەویەکان بە بەشداری زۆرینەی غەزاکەرانی دانیشتوانی مەککە بە شێوەیەکی گشتی لە بەرەی (شام)دا. وەك دەردەکەوێت ئەم کارەی (ئەبوبەکری خەلیفە) ئامانجدار بووە، ئەو دەرکی بە هەبوونی پەیوەندی پتەوو ڕیشەداری (بەنی ئومەییە)و (مەککەیی)یەکانو (هۆزە عەرەبە نشیتەجێکانی وڵاتی شام)ی ژێر دەسەڵاتی حوکمی (بیزەنتی) کردبوو، ئەم پەیوەندیانە ڕەگەکانیان قوڵ دەبنەوە بۆ سەردەمی جاهیلیو لە ماوەی چالاکی بازرگانی بەردەوامی نێوان مەککەو شامدا دروست ببوون کە ئومەویەکان دیارترین پێشەنگی ئەم کاروانە بازرگانیانە بوون.[2] سەبارەت بە بەشداریکردنی ئومەویەکان لە (فتوحات)دا، ئەوان لە بەرەبەیانی بەڕێکەوتنی کاروانە سەربازیەکانیدا بەشداربوون، بە جۆرێك: (وەلیدی کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبی موعیت) لەگەڵ (خالیدی کوڕی وەلید) بەشداری یەکەمین کاروانی فتوحاتی کرد کە بەرەو (عێراق) بەڕێکەوتو ئامادەی کوشتنی (هورموز) بوو، (خالید) بە دەستکەوتەکانی ئەم جەنگەوەو موژدەی سەرکەوتنەوەو هەواڵی کۆبوونەوەو خۆڕێکخستنەوەی سەرلەنوێی فارسەکانەوە بەرەو لای ئەبوبەکری ناردەوە،[3] ئەمجا (خەلیفە) فەرمانی پێدا بە هاوار (عیازی کوڕی مەغنەم)ەوە بچێت –کە لە لایەن خەلیفەوە فەرمانی پێکرابوو لە باکوورەوە (عێراق) فەتح بکات، ئەو کاتە گەمارۆی (دومة الجندل)ی دابووو ئاستەنگی گەورەی هاتبوونە ڕێو شپرزە ببوو– ئەمەو (وەلید) ئاماژەی پێدا داوای کۆمەك لە (خالیدی کوڕی وەلید) بکات، بەسەر قسەی ئەو داوای لێکرد، ئەویش بە فریای کەوتو هەردووکیان پێکەوە (دومة الجندل)یان

---

١ الدولة الأموية، حمدي شاهين (ص: ١٤٩).

٢ المصدر نفسه (ص: ١٤٩).

٣ البداية والنهاية (٦/٣٥٤).

فەتح کرد.[١] ئـەمجا (ئـەبو بـەکر) کـردی بـە سەرپەرشـتیاری نیـوەی سـەدەقاتی (قوزاعـە)ی هاوسێی (دومة الجندل)،[٢] بەڵام هێندەی نەخایاند (خەلیفە) لە نامەیەکیدا (جیهادکردنی ڕێـی خودا)ی بۆ خستبووەڕوو، پێـی ڕاگەیانـدبوو کـە دەتوانێـت یـەك لـەم دوانـە: (جیهـادی ڕێـی خودا)یان (مانەوە لەسەر پۆستی ئێستا)ی هەڵبژێرێت، (وەلید) وەڵامی دایـەوە کـە (جیهـاد) هەڵدەبژێرێت، ئەویش بەرەو (شام)ی بەڕێکرد،[٣] یەکەمین لیوای سـەربازی جـەنگی شـام، لـە لایەن (ئەبو بەکر)ەوە بۆ (خالیدی کوڕی سەعیدی کـوڕی عاصـی ئومـەوی) بەسـترا، پاشـان (خالید)ی لێخستو (یەزیـدی کـوڕی ئـەبی سـوفیانی کـوڕی حـەربی ئومـەوی) لـەجێ دانـا.[٤] یەکەمین سوپای گەورە کە (ئەبوبەکر) بـەرەو (شـام)ی بـەڕێکرد، بریتـی بـوو لـە سـوپاکەی (یەزیدی کوڕی ئەبی سـوفیان)، خـودی (خەلیفـە) بـە پێیـان پێـشی کـەوتو خوداحـافیزەی لێکـرد.[٥] ئـەمجا (٣) سـوپای تـری ڕێکخـستن‌و بـە سـەرکردایەتی (عـەمروی کـوڕی عـاص‌و شرەحبیلی کوڕی حەسـەنەو ئـەبو عوبەیـدی کـوڕی جـەڕراح) بـەدوای سـوپاکەی (یەزیـد)دا بەرەو (شام)ی بەڕێکردن.[٦]

(ذهبي) دەربارەی (یەزیـدی کـوڕی ئـەبی سـوفیان) دەڵێـت: ئـەو یـەکێك بـوو لـەو چوار کەسانەی (ئەبوبەکر) کاری غەزای (ڕۆم)ی خستنە ئەستۆ، (ئەبوبەکر) سوپای بۆ ڕێکخست‌و بە پیادەو شان بە شانی وڵاخەکەی یەزید، دەڕۆیشت، وەسێتی بۆ دەکـردو خواحـافیزەی لێ دەکرد، ئەم تەنها بە خاتری شـکۆمەندی‌و دینـداری زەیـد بـووو بـەس.[٧] ئـەمجا خـەڵکانێکی تریش کە حەزیان لە جیهاد دەکرد، لە لایـەن (ئەبوبـەکر)ەوەو لـە سـوپایەکدا ڕێکخـران‌و بـە سـەرکردایەتی (معاویـەی کـوڕی ئـەبو سـوفیان) دیـسان بـەرەو (شـام) بـەڕێکران،[٨] (ئـەبو سوفیانی کوڕی حەرب) کە ئـەو کاتـە زۆر پـیر ببـوو، بـۆ غـەزا دەرچـوو،[٩] بـە هـەمان شـێوە (خالیدی کوڕی سەعیدو عەمروی کوڕی سەعیدو ئەبانی کوڕی سەعید)یش بەشداری جـەنگو

---

١ تاريخ الطبري (٣/٣٩٠)، الدولة الأموية، حمدي شاهين (ص: ١٤٩).
٢ المصدر نفسه (٣/٣٩٠).
٣ المصدر نفسه (٣/٣٨٩ـ٣٩٠).
٤ المصدر نفسه (٣/٣٨٧).
٥ فتوح الشام للواقدي (١/٣ـ٤).
٦ تاريخ الطبري (٣/٣٩٤).
٧ سير أعلام النبلاء (٣/٣٢٨).
٨ تاريخ الطبري (٣/٣٩١).
٩ ئەو کاتەی بەشداری جەنگی (یەرموك)ی کرد تەمەنی لە (٧٠)ساڵ زیاتر بوو کە مرد تەمەنی (٨٨) ساڵ بوو.

جیهادی (شام)یان کردو تا هەرسێکیان نەکوژران کۆڵیان نەدا، تاکو ئەوەی دەوترا: هەر کێوێك لە کێوەکانی شام فەتح کرابایە پیاوێکت لە ڕۆڵەکانی (سەعیدی کوڕی عاص)ت بە شەهیدی لە لاپاڵێکیدا دەدۆزیەوە.[1] دەڵێن: سەرکردەکانی سوپا، پێش دەستپێکردنی جەنگی (یەرموك) لە (جۆلان) کۆنگرەیەکیان بەست، (ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب) بە تەکیاندا تێدەپەڕیو دەڵێت: پێم وانەبوو هێندە بژیمو ژمارەیەك منداڵی (قورەیش) ببینمو باسی جەنگو هەراکانیان بکەن لە بەرانبەر دوژمنیانداو منیش لە ماڵەوە بمو بانگم نەکەنو بەشداری ڕاوێژیان نەبم، ئەوانیش جێگەیان بۆ چۆڵ کردو لە دانانی نەخشەی جەنگەکەدا بەشداریان بوو،[2] کاتێك وادەی جەنگوپێکهەڵشاخانی نێوان سوپای (ئیسلام)و سوپای (ڕۆم) لە (یەرموك) نزیك بۆوە، سەرکردەکانی هەردوولا گرو تینی گیانی جەنگیان بەبەر سەربازەکانیاندا دەکردنو هانیان دەدان، (قسیسو ڕەبەنەکانی ڕۆم) باسو خواسی نەسرانیەتیان بۆ سەربازەکانیان دەخوێندەوەو بەرەو گۆڕەپانی ئەو جەنگە هەڵیاندەنان کە لە دوای ئەو وێنەی نەبێتەوە،[3] موسڵمانەکان لە خوێندنەوەی وتاری ڕەوانو پەخشانە شێعری کوردتدا پەلەپەلیان دەکرد،[4] بەڵکو ئەوان یەکێك لە مێردەزمە گەورەکانی خۆیان –کە (موخەزرەم) بووو لە ڕووداوەکانی جاهیلیو سەردەمی ئیسلام ئەزموونی وەرگرتبووو، لە وتنی چیرۆكو پەخشانە شێعردا دەستێکی باڵای هەبوو– کرد بە وتاربێژی خۆیان، ئەویش خودی (ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب) بوو،[5] گومانی تێدا نیە سەرپەرشتی کردنی کارێکی گرنگو هەستیاری لەم جۆرە دەبێتە گەورەترین بەڵگە بۆ ڕاستگۆییو دڵسۆزی ئەو پیاوە بۆ دینداریو ئیسلام بوونەکەی، چونکە ئەگەر سەرکردە سەربازیەکانی ئەو کاتە جگە لە دڵسۆزی شتێکی تریان لە هەناوی ئەودا بەدی بکردبایە هەرگیز نەیاندەکردە ئەمینداری پرۆسەی بوژاندنەوەی ڕوحی جیهادو بەرەنگاربوونەوەی سەربازەکانو بزواندنی دەماری ئیسلامەتییان، خۆ ئەگەر سەربازەکان جگە لە ڕاستگۆیی شتێکی تریان پێوە دیبایە بەم شێوەیە کاریگەری قسەکانی ئەویان لەسەر دانەدەنرا، ئەو پیاوێکی پیاوانەو سەرکەوتووو مەیدانی بووو قسەکانی لەگەڵ سروشتی پێکهاتەی سوپاکە دەهاتەوە، ـــ کە زۆرێك لە

---

١ النزاع والتخاصم (ص: ٤٦)، الدولة الأموية، حمدي شاهين (ص: ١٥٠).

٢ فتوح الشام للواقدي (١/٩٩).

٣ تاريخ الطبري (٣/٣٩٥).

٤ المصدر نفسه (٣/٣٩٥، ٣٩٧، ٣٩٨، ٤٠١).

٥ المصدر نفسه (٣/٣٩٧).

دانیشتوانی (مەككە)و ئەو هۆزە عەرەبیانەی لەخۆگرتبوو كە درەنگ وەخت موسڵمان ببوون، ئەمانە لەسەر متمانەی لەمێژینەیان بە ئەبو سوفیان مابوونەوە ـ كە سەركردەیان بووەو تاقیان كردبووەوە.[1]

ئەبو سوفیان (خودا لێی ڕازی بێت) بەرەو ڕووی كەتیبە سەربازیەكانی سوپای ئیسلام یەك بەخۆ هاواری دەكردو دەیگوت: ألله، ألله، ئێوە پارێزەری عەرەب‌و پشتیوانانی ئیسلامن، ئەوانیش پارێزەری (ڕۆم)و پشتیوانانی شیركن، خودایە! ئەم ڕۆژە ڕۆژێكە لەنێو ڕۆژەكانتدا، خودایە، سەركەوتن بۆ بەندەكانت بنێرە.[2]

## دووەم: لە سەردەمی عومەری كوڕی خەتابدا (خودا لێی ڕازی بێت)

كاتێك لە ساڵی (13)ی كۆچیدا صدیق كۆچی دوایی كردو بەیعەتی خیلافەت درا بە (فاروق)، لە بەكارهێنانی (بەنی ئومەییە)داو متمانە خستنە سەریاندا لەسەر هەمان پەیڕەوی پێغەمبەری خودا (ﷺ)و ئەبوبەكری صدیق (خودا لێی ڕازی بێت) ڕۆیشت، هیچ كامێك لە خاوەن پۆستە بەرزەكانی (ئەو تیرەی) لێ نەخست‌و ڕەخنەی لە هیچ كامێكیان نەگرت، ئەمە لەگەڵ ئەوەدا كە هەموومان ئەوەمان زانیوە (عومەر) دارای عەزم‌و ئیرادەیەكی بەهێز بوو، بە دواداچوونێكی پڕ وردەكارانەی بۆ كاروباری والی‌و كاربەدەستانی دەوڵەتەكەی هەبووو كاروكردەوەكانی هەڵدەسەنگاندن‌و بەوپەڕی ئازایانەو دادگەرانە لێپرسینەوەی لەگەڵ ئەنجام دەدان، جا كەواتە بەردەوام بوونی كاربەدەستە پلەدارەكانی بەنی ئومەییە لە دەوڵەتەكەی عومەردا دەبێتە بەڵگە بۆیان كە ئەمیندارو لێوەشاوە بوون، وەك دەبینین یەزیدی كوڕی ئەبی سوفیان بە والی (دیمەشق) مایەوە، هەروەكو چۆن عومەر سنووری دەسەڵاتی (معاویە)ی لە (شام)دا بەرفراوانتر كرد.[3]

### 1ـ هەڵاتنی ئەستێرەی (معاویە):

ئەستێرەی (معاویە) لە ئاسمانی گۆڕەپانی كاروچالاكیە سیاسی‌و ئیداریەكانی سەردەمی (خەلیفە عومەر)دا (خودا لێی ڕازی بێت) دەركەوت، لە ساڵی (15)ی كۆچیدا عومەر ئەركی فەتحكردنی (قیساریە)[4]ی پێ سپارد.[5]

---

1 الدولة الأموية، حمدي شاهين (ص: 151).
2 التبيين في أنساب القريشيين (ص: 203).
3 العالم الإسلامي في العصر الأموي (ص: 15).
4 (قِسارية): شارێكە لەسەر كەنارە ئاوی شام ، سەر بە (فەلەستین)و، ياقوت (4/421).
5 أثر العلماء في الحياة السياسية في الدولة الأموية (ص: 59).

لە نامەکەی (عومەر)دا بۆ (معاویە) هاتووە:

.... ئەمجا سەرپەرشتیکردنی فەتحی (قیساریە)م دایە دەست تۆ، بۆی بچۆو داوا لە خودا بکە سەرت بخات بەسەریاندا، زۆر بڵێ: (لا حول ولا قوة إلا بالله العلي العظيم، ألله ربنا وثقتنا ومولانا، فنعم المولى ونعم النصير).[1]

عومەر (خودا لێی ڕازی بێت) بەم ئەرکە گەورەو گرنگە تاقیکردنەوەیەکی گەورەی بە (معاویە) کرد لە گۆڕەپانی واقیعدا، (معاویە) توانی لەم ئەزموونەدا سەربکەوێت، ئەمەو بەخۆیو ئەو سوپا سەربازەی کە لایەن (یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان)ی برایو یەك لە والیەکانی (شام) بۆی سازکرابوو بەرەو (قیساریە) بەڕێکەوێت، (قیساریە) بە قەڵا گەمارۆ درابووو دانیشتوانەکەشی بە سیفەتی ئازایەتی ناسرابوون، (معاویە) ماوەیەکی درێژ گەمارۆی دا، دانیشتوانەکەی چەندین جار هێرشیان هێناو ویستیان بازنەی گەمارۆیەکە بشکێنن، بەڵام (معاویە) نائومێد نەبوو، عەزمی جەزم کرد فەتحی بکات، هەموو تواناکانی خۆیو سوپاکەی خستەگەڕو دەستی بە جەنگ کرد، دەرەنجام خودا لەسەر دەستی ئەو فەتحی کرد، فەتحکردنی ئەم شارە یەکێك بوولە چالاکیە هەروگەورەکان ، نزیکەی (١٠٠) هەزار لە دانیشتوانەکەی کوژران،[2] ئەمەو هەواڵی سەرکەوتنو پێنجیەکی دەستکەوتەکانی جەنگەکەی بۆ ئەمیری ئیمانداران عومەری کوڕی خەتاب (خودا لێی ڕازی بێت) بەڕێکرد.[3] (معاویە) بەم فەتحە دوای پشتیوانی لێکرانی لە لایەن خوداوە شایستەییو جوامێریو جوانسەرکردایەتی خۆی سەلماندو بۆی بەخێر گەڕاو بوو بە مایەی جێی متمانەو پشت پێبەستنی جەماوەر، یەزیدی برای والی (دیمەشق) زیاتر پشتی گرتو ئەرکی فەتحکردنی کەنارەکانی (شام)ی خستە ئەستۆ، لە ماوەی ئەنجامدانی ئەم ئەرکەشیدا ڕۆڵێکی گەورەو جوامێرانەی گێڕا.[4] جار هەبوو ماوەی دوو ڕۆژ یان چەند ڕۆژێکی کەم لە دەورەی قەڵایەك دەمانەوە، جار هەبوو شەڕێکی توندو دەستەویەخە ڕووی دەدا، جار هەبوو خێرا فەتح دەکرا، هەر جارێك شارێکی دیار یان سەرکەنارێك فەتح کرابایە بەپێی پێویست سوپای ئیسلام لەوێدا دەمایەوە، ئەگەر

---

١ تاريخ الطبري (٤/٤٣١).

٢ ترتيب وتهذيب، البداية والنهاية (ص: ٦٣، ٦٤).

٣ البداية والنهاية (٧/٥٤).

٤ أثر العلماء في الحياة السياسية في الدولة الأموية (ص: ٥٩).

لـە لایـەن دوژمنـەوە شـتێك ڕوویدابایـە كۆمـەڵێكیان دەگەیانـدە ئـەو شـوێنەو چارەسـەریان دەكرد.[١]

بەڕای (د. عبدالرحمن الشجاع): بە خاتری ئەوە (ڕۆمەکان) لە شکستدا بوونو بیریـان لـە بـەرەنگاری نـەدەكردەوە، شـارەكانی شـام دوابـەدوای یـەكو لـە ژێـر لێـدانو هەڵمـەتی موجاهیدانـدا فـەتح كـران، ئەمـەو شـارەكانی (بـەیروت، صـەیدا، نـابلوس، لـود، حەلـەب، ئەنتاكیە) لەسەر یەك فەتح كرانو بۆ دواجـاریش شـاری (قیـساریە) لـە دوای فـەتحی شـاری (قودس) لەسەر دەستی (معاویە) فەتحكرا.[٢]

عوبادەی كوڕی صامت (خودا لێـی ڕازی بێـت) لـە گـەمارۆی (قیـساریە)دا سـەركردایەتی بـاڵی ڕاسـتی سـوپای ئیـسلامی دەكـرد، هەسـتایە سـەر پـێو دەسـتی بـە ئامۆژگـاریكردنی سەربازەكانی كردو پێی ڕاگەیاندن كە بە خۆیاندا بچنەوەو ئاگایان لە خۆ بێتو گوناهو تاوان ئەنجام نـەدەن، هەڵمـەتی بـردو ژمارەیـەكی زۆری لـە سـوپای ڕۆم كوشـت، بـەڵام نـەیتوانی ئامانج بپێكێت، گەڕایەوە ئەو شوێنەی هەڵمەتەكەی تێدا دەستپێكردبوو، سەربازەكانی هـان دەدا جیهـاد بكـەن، سەرسـوڕمانی خـۆی سـەبارەت بـە سـەرنەگرتنی هێرشـەكەی پێـشوو دەربڕیو وتی: ئەی ئەهلی ئیسلام من لە هەموو هاوەڵەكان كەمتەمەنتر بوومو ئەجەلی مەرگم لە هی هەموانیان درەنگوەختتر بوو، خودا بڕیـاری وابـوو بمهێڵێتـەوە تـا بەهاوشـانی ئێـوە جەنگ لەگەڵ ئەم دوژمنەتاندا بكەم.. سوێند بەو كەسەی گیانی منی بە دەستە، لەگەڵ هـەر تاقمە ئیماندارێك پەلاماری موشریكەكانمان دابێت هێندەی پێ نەچووە گۆڕەپـانی جـەنگیان بۆ چۆڵ كردووینو خودا سەركەوتنی بەسەر ئەواندا پێ بەخشیوین، باشە ئێوە بـۆ هێرشـتان كردە سەر ئەوانە ڕاتان نەماڵین؟!،[٣] ئەمجا بۆی دەرخستن كە لە چ شـتێكیان لێ دەترسـێت، وتی: بە خوا من مەترسی دوو سیفەتی خراپتان لێ دەكەم: یان دەبـێ دزیتـان كردبێـت، یـان هێرشـەكەتان بـۆ ڕەزای خـودا نـەبووبێت،[٤] پاشـان هاوڕێكـانی هانـدان بـە ڕاسـتی داوای شەهادەت بكەنو پێشی وتن: كە ئەو لەم هێرشە تـازەدا لـە پێـشەوەیان دەڕواتو تـا خـودا فەتحیان بۆ تۆمار دەكات یان شەهیدی بە نـسیب دەكـات ناگەڕێتـەوە جێـی خـۆی.[٥] كاتێـك

١ فتوح البلدان للبلاذري (ص: ١٣٤).

٢ دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة (ص: ٣٥٥).

٣ الانصار في العصر الراشدي (ص: ٢٠٧).

٤ المصدر نفسه (ص: ٢٠٩).

٥ المصدر نفسه (ص: ٢٠٩).

موسڵمانەکان‌و ڕۆمەکان دەستەویەخەی یەکتر بوون، (عوبادە) لە وڵاخەکەی دابەزی‌و بە پیادە کەوتە جەنگەوە، کە (عومەیری کوڕی سەعدی ئەنساری) ئەم دیمەنەی بینی بانگی موسڵمانەکانی کرد پێی ڕاگەیاندن کە وێنەی فەرماندەکەیان لە وڵاخەکانیان دابەزن‌و بە پیادە جەنگ بکەن، دەستیان بە کوشتاری ڕۆمەکان کردو کۆڵیان لێ نەدان‌و ڕاویان نان‌و لە قەڵاکانیان قایم کردنەوە،[1] دوابەدوای فەتحکرانی (قیساریە)و سەرکەوتنی (معاویە) لە فەتحکردنی ناوچە کەناریەکانی (دیمەشق)، (عومەری کوڕی خەتاب) (خودا لێی ڕازی بێت) لە ساڵی (١٧)ی کۆچیدا ویلایەتی ئەردەنی خستە ژێر دەستی (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت).[2]

**٢ـ ویلایەتی (معاویە) بەسەر (دیمەشق‌و بەعلەبەك‌و بەلْقا)وە:**

لە ساڵی (١٨)ی کۆچی یەزیدی کوڕی ئەبی سوفیان (خودا لە هەردووکیان ڕازی بێت) بە دەردی تاعونی (عەمواس)کۆچی دوایی کرد، عومەر (خودا لێی ڕازی بێت)، معاویەی برای خستە جێگاکەی‌و ویلایەتی (دیمەشق‌و بەعلەبەگو بەلْقا)ی ڕادەست کرد،[3] ئەم کارەی (عومەر) گەورەترین کاریگەری ئیجابی لەسەر دڵ‌و دەروونی باوك‌و دایکی (معاویە) دانا، کاتێك عومەر سەرەخۆشی کۆچی دوایی (یەزید)ی لە (ئەبو سوفیان) کرد، (ئەبو سوفیان) وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران کێت لەجێدا دانایەوە؟، (عومەر) وتی: (معاویە)ی برای ، (ئەبو سوفیان) وتی: سیلەی ڕەحمت بەجێ گەیاند ئەی ئەمیری ئیمانداران.

دەستبەجێ (ئەبو سوفیان) نامەیەکی ئامۆژگاری ئامێزی بۆ (معاویە) نارد، نوسیبووی: ڕۆڵەگیان: ئەم کۆمەڵە کۆچەرانە پێشمان کەوتن‌و ئێمەش بە درەنگەوە هاتین، زوو ئیسلام بوونیان بەرزی کردوونەتەوەو لە لای خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ)ی نزیك کردوونەوە، درەنگ موسڵمانبوونمان ئێمەی دواخست، جا کەواتە ئەوان بوون بە سەرکردەو سەروەرو ئێمەش بووین بە شوێنکەوتوو فەرمانبەرداریان، پۆستێکی زۆر گەورەو گرنگیان لە کاروباری خۆیان پێ بەخشیوی، کەواتە نەکەی سەرپێچی ئەوان بکەی، چونکە تۆ ماوەیەك لەسەر ئەم پۆستەت دەمێنیەوەو با پشووت درێژ بێت‌و بارت قوڵ بێت، ئەگەر تۆ گەیشتیتە لوتکەی چاکەکاری ناوو ناوبانگت بە باشەو سوپاسکراوی دەمێنێتەوە،[4] هەروەها (هیندی کچی

---

١ المصدر نفسه (ص: ٢٠٩).

٢ تاريخ الطبري (٦٧/٤)، خلافة (معاوية) للعقيلي (ص: ١٧، ١٨).

٣ الطبقات الكبرى (٤٠٦/٧)، أثر العلماء في الحياة السياسية (ص: ٦١).

٤ البداية والنهاية (٣٩٩/١١).

عوتبە)ی دایکشی نامەیەکی بۆ نووسیو دەیوت: بە خوا ڕۆڵەگیان کەم وا هەیە وێنەی تۆ لەدایك ببێت، ئەم پیاوە بەهۆی ئەم پۆستەوە بەرزی کردیەوە کەواتە هەر فەرمانێکی ئەوت پێ گەیشت پێت خۆش بێت یان پێت ناخۆش بێت جێبەجێی بکە.[1]

ژمارەیەك لە خەڵك، بە تایبەتی پیرەکانیان، پێیان کارێکی نامۆ بوو عومەر (خودا لێی ڕازی بێت) لەگەڵ هەبوونی پیاوانێکی بە تەمەنترو باشتردا، تازەپێگەیشتوویەکی کەمتەمەنی وەك (معاویە)ی بۆ ئەم کاروبارە هەڵبژاردووە، بەڵام عومەر (خودا لێی ڕازی بێت) کاتێك گوێبیستی ئەم قسەیە بوو: (ئەم کوڕە گەنجەی کردووە بە والی!)، ڕایگەیاند کە کارێکی دروستی کردووەو وتی: سەبارەت بە ویلایەتی (معاویە) لۆمەم دەکەن! من گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو دەیفەرموو: ((اللهم اجعله هادياً، مهدياً واهد به))[2] واتە: خودایە بیگێڕە بە پیاوێکی ڕێنماکراوو ڕێنوماکەرو هۆکاری ڕێنمایی کرانی خەڵکی.

**٣ــ خۆڕانواندنی (معاویە) لە کەژاوەیەکی سەربازی گەورەداو ڕەخنەی عومەر لە بەرانبەریدا:**

عومەر (خودا لێی ڕازی بێت) شارەزای ناخی پیاوان بوو، سەرناس بوو ئەوەندەی ئەو شارەزای ئەو سیفەتانەی (معاویە) بوو کە سازو بازی دەکەن بۆ سەرکردایەتی کردن، زۆرێك لە خەڵکانی تر ئەمەیان نەدەزانی، کاتێك (عومەر) بەرەو (شام) بەڕێکەوت، (معاویە) بە ڕەوەیەك وڵاخە بەرزەی زینکراوو سوپایەکی سوارەی پۆشتەو پەرداخەوە پێشوازی لێکرد، (عومەر) ڕەخنەی لێگرتو پێی وت: تۆ خاوەنی ئەم کەژاوە مەزنەی؟، وتی: بەڵێ، وتی: ئەمە لەگەڵ ئەوەدا کە خۆت پێت ڕانەگەیاندم خەڵکانی خاوەنپێداویستی ماوەیەکی درێژخایەن لەبەر دەرگاکەت ڕادەوەستن؟، وتی: ئەوەی پێت ڕاگەیەنراوە هەر وایە، وتی: مادام وابێت ئەمەت لە چیە؟و بۆ وا دەکەی؟ دەڵێم فەرمانت پێ بکەم بە پێخواسی بەرەو وڵاتی (حیجاز) بەڕێبکەوی. وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران: ئێمە لە خاکی وڵاتێکین سیخوڕگەلێکی سەر بە دوژمنی تێدان، بۆیە پێویستە بە خاتری بەهێزکرنو سەرخستنی ئیسلامو ئەهلی ئیسلام هێزو پێزو هەیبەتی دەسەڵاتداری تێدا دەرکەوێتو بیانترسێنێت، چ فەرمانێکم بەسەردا دەکەی جێبەجێی دەکەم، چ شتێکیشم لێ قەدەغە دەکەی وازی لێ دێنم، (عومەر) وتی: پرسیاری هەر شتێکم لێکردیو ڕەخنەی هەر شتێکم لێ گرتی وەڵامێکی وا پڕ

---

١ البداية والنهاية (٣٩٩/١١).

٢ السلسلة الصحيحة (٦١٥/٤)، رقم (١٩٦٩).

بە پێستت دامەوەو بە شی کەلێنی نێوان دوو پەنجەت بۆ نەهێشتمەوە، ئەگەر ئەوەی وتت ڕاست بێت: ئەمە ڕایەکی ژیرانەیە، ئەگەر ڕاستیش نەبێت، ئەوە فێڵێکی لێزانانەیە.[1]

وتی: کەواتە فەرمانم بەسەردا بکە ئەی ئەمیری ئیمانداران، وتی: نە فەرمانت بەسەردا دەکەمو نە ئەنجامدانی هیچ کارێکیشت لێ قەدەغە دەکەم، پیاوێك وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران ئەم گەنجە چەند بە لەباری خۆی لە دەستی تۆ ڕزگار کرد!، عومەر وتی: بە خاتری ڕێکوپێکی سەرچاوەکانی و بەهێزی بەڵگەکانی ئەم کارەی خستوومانەتە ئەستۆی خستمانەوە سەرشانی،[2] لە ڕیوایەتێکی تردا کابرای قسەکەر (عبدالرحمن ی کوڕی عەوف) بوو، لەگەڵ (عومەر) هاتبووە شامو لەلایەن معاویەوە بەو شێوەیەی باسکرا پێشوازی لێکردن.[3] ئەم وەڵامەی (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) بەڵگەیە بۆ ئەو کە خاوەنی شارەزاییەکی سیاسی بەرزو ناسینێکی فامیدانە لەسەر بارودۆخی گەلانو زانیاریەکی تێروتەسەل لەسەر بەڕێوەبەرایەتیکردنی جەماوەرو پارێزگاریکردنی بارودۆخی ئاسایشی وڵاتو دەوڵەتەکەی، لە پێناوی ئەمەدا عومەر (خودا لێی ڕازی بێت) بە شێوەیەکی گشتی بە شێوەیەکی گشتی لە سیاسەتەکەی ڕازی بوو، ئەگەرچی سیاسەتەکەشی سەبارەت بە گرنگیدان بە بارودۆخی ڕەعیەتو بەدەممەوەچوونی سکاڵاکانیان لەگەڵ سیاسەتی عومەر تێکی نەدەکردەوە، لەوانەیە ئەم ڕستەیەی عومەر (خودا لێی ڕازی بێت): (من أجل ذلك جشمناه ما جشمناه) بەڵگە بێت لەسەر ڕازی بوونی لە سیاسەتی معاویە[4]. عومەر (خودا لێی ڕازی بێت) پەیوەندی بە معاویەوە دەکردو پەروەردەو ئامۆژگاریکردنی ئەوی فەرامۆش نەدەکرد، جاروبار لێی توند دەکردو بە ڕەقی لەگەڵی دەجوڵایەوە، ئەسلەمی خزمەتکاری عومەر (خودا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: (معاویە) لە شامەوە هاتە لامانو لە هەموو خەڵك جوانترو بە ڕەنگو ڕووترو سپی تر بوو، لەگەڵ عومەر بۆ جەح بەڕێکەوت، عومەر تەماشای دەکردو پێی سەرسام ببوو، ئەمجا پەنجەی لەسەر پشتی دادەناو خەتێکی لەسەر دەکێشاو بەرزی دەکردەوە، جا دەیوت: بەخ، بەخ، ئێمە خێرو بێری دنیاو دواڕۆژمان بۆ کۆبووەتەوە کەواتە ئێمە لە هەموو خەڵکی باشترین، (معاویە) وتی: لەمەولا قسەت بۆ دەکەم، ئێمە لە خاکێکی بە پیتو بەرەکەتینو شارەدێو حەمامی زۆری تێدان.

---

١ البداية والنهاية (١١/٤١٦).

٢ المصدر نفسه (١١/٤١٦).

٣ المصدر نفسه (١١/٤١٦).

٤ الأمويون بين الشرق والغرب، لمحمد الوكيل (١/٣٠).

عومەر وتی: منیش قسەیەکت بۆ دەکەم، باشە چۆنە دەربەستی نەفسی خۆتیو بە تامترین خۆراکی دەدەیتیو لە خەو هەڵناستی تا تیشکی خۆر پشتت گەرم دانەهێنێتو موحتاجو هەژارانیش لە پشت دەرگاکەتەوە ڕادەوەستن، ئەسلەم وتی: کاتێك گەیشتینە (ذو طوی)، (معاویە) دوو پشتەماڵی جوانو بە نرخی دەرهێنانو لە خۆی هاڵاندن، عومەر (خودا لێی ڕازی بێت) بۆنێکی لێ کرد وای زانی بۆنی عەترە، بۆیە وتی: یەکێك لە ئێوە بۆ حەج دێتو چڵکن دەبێت، کە گەیشتە گەورەترین وڵاتی خودا لە حورمەتدا پشتەماڵی وەکو بلێی بۆندار دێنێتە دەرو لەبەریان دەکات!

معاویە وتی: بۆیە پۆشیمن تا پێیان بگەڕێمەوە لای هۆزەکەم، بە خودا، خودا دەزانێ کە من شەرمو شکۆی تێدا دەنوێنم، ئەمجا (معاویە) دوو پشتەماڵە بە نرخەکەی دانانو دوو پشتەماڵەکەی پێشدای لەبەرکردنەوە کە ئیحرامی پێوە بەستبوون.[1]

(عەمروی کوڕی یەحیای کوڕی سەعیدی ئومەوی) لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: (معاویە) بە پۆشاکێکی سەوزەوە هاتە لای (عومەر)و هاوەڵانیشی تەماشایان دەکرد، کە عومەر ئەمەی بینی شوڕکەدارێکی بە دەستەوە گرتو لە پشتی دەدا، معاویەش دەیوت: ئەی ئەمیری ئیمانداران بۆ خاتری خودا کۆڵم لێدە، عومەر گەڕایەوە شوێنی خۆی، ئامادەبووان وتیان: ئەی ئەمیری ئیمانداران! لە هۆزەکەتدا وێنەی ئەوی تێدا نیە؟ بۆچی لێتدا؟ عومەر وتی: سوێند بە خوا جگە لە خێرو چاکە هیچی ترم (پێوە) نەبینی، جگە لە خێرو چاکە هیچی تری پێ نەگەیاندم، بەڵام من ئاوام بینی (بە دەست ئاماژەی بۆ کرد)، بەڵام حەزم دەکرد ئەو (پۆشاکەی) لەبەر دانێم کە تووشی لوتبەرزی دەکات.[2]

هەر کاتێك (عومەری کوڕی خەتاب) معاویەی ببینیایە دەیوت: ئەمە کیسرای عەرەبە.[3]

کاتێك (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) والی شام بوو پۆشاکی شایانەی دەپۆشی، بە ڕای خۆی ئەو لە سەنگەرەکانی پێشەوەی دوژمندایە بۆیە پێویستە بەو شێوەیە سامو هەیبەتو شکۆداری پێوە دیار بێتو خۆی لە بەرگو پۆشاکی ڕازاوەی سەڵتەنەتو جەنگو جیهاددا ڕانوێنێتو دوژمن لێی بترسێت.[4] بە ڕای ئەو کاتێك خودا زەمبی دەسەڵات دەکات لەم

---

١ البداية والنهاية (١١/٤١٧).

٢ البداية والنهاية (١١/٤١٨).

٣ المصدر نفسه (١١/٤١٧)، الاستيعاب (ص: ٦٦٨).

٤ ابن خلدون إسلامياً، عماداللە خليل (ص:٧٨).

ڕووەوە زەمبی ناکات کە هەق سەرخاتو خەڵك گەردنکەچی (دین) بکاتو چاودێری بەرژەوەندیەکان بکات، بەڵکو لەم ڕووەوە زەمبی دەکات ناهەق زاڵ بکاتو مرۆڤەکان بچەوسێنێتەوە، خۆ ئەگەر دەسەلات بۆ باڵادەستکردنی دینی خوداو جەنگو جیهادی دوژمنو بەختەوەرکردنی بەندەکانی خودا بەکاربێت ئەوا زەمبکراو نیە،[1] خودای بەرزو بڵند دەفەرمووێت: ﴿رَبِّ ٱغْفِرْ لِي وَهَبْ لِي مُلْكًا لَّا يَنۢبَغِي لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِيٓ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ﴾[2] واتە: ئەی پەروەردگار! لێم خۆش ببەو دەسەلاتێکی وام پێ ببەخشە کە کەس دوای من پێی نەدرێت، بەڕاستی تۆ بەخشندەی. کاتێك سلێمان (سەلامی خوای لێ بێت) دەرروونی خۆی ناسیو زانی هیچ شتێکی ناڕەواو نادروست تێکەڵ بە پێغەمبەرایەتیەکەی نابێت بۆ گەیاندنی پەیامەکەی داوای دەسەلاتی لە پەروەردگار کرد، بێگومان خۆڕانواندنی (معاویە) لە شانو شکۆی دەسەلاتداریدا مەبەستی شەرعی لەخۆگرتبوون، بۆیە عومەر لێی بێدەنگ بوو، ڕۆژێکیان لە لای عومەر باسی (معاویە) کرا، عومە وتی: واز لەم گەنجەی قورەیشو کوڕی گەورەی قورەیش بێنن، ئەو کەسێکە لە کاتی تووڕەییدا پێدەکەنێتو بە خۆشی خۆی نەبێت هیچی لێ دەستگیر ناکرێت، مەگەر لە لای قاچیەوە دەنا لە بارێ سەریەوە[3] کەس ناتوانێ زەفەری پێ بەرێت، هەرچەندە لەم ڕیوایەتەداو ڕیوایەتەکانی تریشدا زێدەڕەوی بەدی دەکرێت، بەلام متمانەبوونی عومەر لەسەر (معاویە) لە پشت هەموو شكو گومانێکەوە بووە.[4]

معاویە بۆ عومەری سەلماند کە چەند بە تێکەیشتنێکی بەرفراوانو قوڵەوە لە سیاسەتو هۆکارەکانی گۆڕانی دەورروبەرو کۆمەڵگاو کاریگەریان لەسەر گەشەپێدانی سیاسیانە بۆ ئامرازەکانی حوکمڕانی حاڵی بووە، بە هەر حاڵ جێگەو پێگەی (معاویە) لە لای عومەر بە گەورە دانراو کردی بە والی گرنگترین ویلایەتەکانیو لەگەڵ ئەوەداو لە ماوەی خیلافەتەکەیدا (زۆرێك لە والیو کاربەدەستەکانی لەسەر پۆستەکانیان دادەبەزاندن) بەلام نەك (معاویە)ی لە پۆستەکەی نەهێنایە خوارەوە بەڵکو سنووری ویلایەتەکەی بۆ فراوانتر کردو دەسەلاتی زیاتری پێدا، بە زیرەکیو کاربەڕێوەبردنەکەی سەرسام ببوو، ئەمەشی لە لای خەڵك

---

١ ص (٣٥).

٢ المصدر نفسه (ص: ٧٨).

٣ البداية والنهاية (١١/٤١٥).

٤ الدولة الأموية، حمدي شاهين (ص: ١٥٤).

نەدەشاردەوە،[1] تا کار بەوە گەیشت ڕۆژێکیان بە ئەندامانی کۆڕەکەی دەڵێ: ئێوە معاویەتان هەیەو باسی کیسراو قەیسەرو زیرەکیەکانیان دەکەن![2]

**٤ـ (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت)و کارو کۆششەکانی لە بەرەی شامدا:**

کاتێك (معاویە) جڵەوی کاروباری شامی بەدەستەوە گرتو (عەمروی کوڕی عاص) بەرەو فەتحی (مصر) دەرچوو، ئەرکی پاسەوانی کردنی سنوورە شامیەکانی دەوڵەتی ئیسلامی‌و بەرفراوانکردنیان کەوتە ئەستۆی (معاویە)و ویلایەتەکەی، گرنگترین دەستکەوتە سەربازیەکانی (معاویە) لە دوو خاڵی سەرەکیدا کورتو پوخت دەکرێنەوە، یەکەمیان: دانانی سیستەمی (غەزای)هاوینەو زستانە، دووەم: پێکهێنانی کەشتیرانیەکی دەریایی ئیسلامی بۆ یەکەمین جار لە مێژووی ئیسلامدا.[3]

أ ـ دانانی سیستەمی (غەزای) هاوینەو زستانە لە سەردەمی عومەردا:

سەربازانی ڕۆمی لەسەر دەستی سەربازانی ئیسلام بۆ چەند جارێك لەسەریەك تاڵاوی شکستیان دەرخوارد درا، دەرەنجام (شام‌و مصر)یان لە دەستدان –کە هەردووك وڵات بایەخی ئابووری‌و سیاسی‌و سەربازی خۆیان هەبوو–، بەڵام ئەوان بەم شکستانەیان وازیان نەدەهێنا، بەڵکو بەردەوام لە گەروو و کەلێنە شاخەکانەوە ــ کە لە تەواوی پارچەکانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمیان جودا دەکاتەوەــ هێرشیان دەهێنا، ئەمە وای لە (عومەری کوڕی خەتاب) کرد –لە کاتی سەردانەکەی شامداو لە ساڵی (١٦)ی کۆچیدا بڵێ: وەڵاهی حەزم دەکرد تایەخێکی زل کەلێنە شاخەکەی گرتبایەو لەمدیوڕا هی ئێمە بوایەو لەودیویشڕا هی (ڕۆم) بوایە.[4] ئەمەو عومەر لەم گەشتەیدا ناوی (زستانەو هاوینەی) لە غەزاکانی ڕۆم ناو کەلێن‌و ڕێگاوبانەکانی سنووری شامی داخستن،[5] پێی دەچێت هێرشەکانی (ڕۆم) بۆ سەر شارە سەرسنووریەکانی ئیسلام لە سەرەتادا بەو ئامانجە بووبێت کە پاسەوانی وڵاتی ڕۆم بکەن‌و موسڵمانەکان بترسێنن کە چی دی نەچنە پێشەوە، بەڵام وەڵامی (معاویە) لە

---

١ المصدر نفسه (ص: ١٥٧).
٢ تاريخ الطبري (٥/٣٣٠).
٣ الدولة الأموية (ص: ١٥٤).
٤ تاريخ اليعقوبي (٢/١٣٣).
٥ تاريخ الطبري (٤/٦٢).

بەرامبەر ئەم هێرشانەدا لە سەرووی کێبەرکەدا بوو، ئەو ئاگری شەڕو جەنگی لە وڵاتی موسڵمانان دوورخستەوەو، بۆ نێو جەرگەی وڵاتی دوژمنی گواستەوە، بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجە دەبوایە (معاویە) گەشەی بەهۆکارو ئامرازەکانی جەنگ دابایە، بۆیە ئەمەی ئەنجام داو سەنگەرەکانی پێشەوەی کردنە بنکەی دەرچوونو هەڵمەت بردنو بەرپەرچدانەوەی دژەهێرشەکان.

معاویە بە خودی خۆی سەرکردایەتی چەند هێرشە هاوینەیەکی کرد، لەو هێرشانە هێرشەکەی ساڵی (٢٢)ی کۆچی بوو بە (١٠) هەزار سەربازەوە چووە نێو خاکی وڵاتی ڕۆمەوە، هەروەها هێرشە هاوینەی ساڵی (٢٣)ی کۆچی،[١] کە لەم هێرشەیدا خۆی گەیاندە (عەموریە)و ژمارەیەك لە یارانی پێغەمبەر (ﷺ)ی لەگەڵدا بوون وەکو: (عوبادەی کوڕی صامت، ئەبو ئەیوبی ئەنساری، ئەبو زەڕی غەففاری، شەدادی کوڕی ئەوس).[٢]

ب- دامەزراندنی کەشتیرانیەکی ئیسلامی لە دەریادا:

ئەم کارە چاکە بە پلەی یەکەم بە هی خودا دادەنرێتو بە پلەی دووەم بۆ (معاویە) دەگێڕدرێتەوە، ئەمەو لەم قۆناغە نوێیەدا بە هۆی ئەم دامەزراوەوە دەروازەی جیهاد لە دەریادا کرایەوە کە بۆ پاراستنی (شامو مصر)و بەرەنگاربوونەوەو بەرپەرچدانەوەی هێرشو پەلامارە یەك لەسەر یەکەکانی کەشتیرانی سەربازی بێزەنتی بۆ سەر کەنارە ئاویەکانی ئەم دوو هەرێمە زۆر پێویست بوو.

چالاکیە سەربازیە هاوینیو زستانیەکان توانیان سنوورێك بۆ هێرشو پەلامارە وشکانیەکانی دوژمن دابنێن، بەڵام شارە سەر کەناریەکان هەر لە (ئەنتاکیە)وە تا (ئەسکەندەریە) لە ژێر گورزی هێزی دەریایی (بێزەنتی)دا مابوونەوە، (معاویە) دەرکی بەوە کرد کە تا ئەو کاتەی دەسەڵاتی دەریایی لە ژێر چنگی (بێزەنتی)یەکان دەرنەهێنێت، ئەوا ناتوانێتو مەحاڵە درێژە بە بزووتنەوەی فتوحات لە ئەفریقیادا بدات،[٣] (معاویە) تا سەردەمی عوسمان دەستی بە غەزای دەریایی نەکرد، بە ئیزنی خودا لەمەولا ئەوە ڕوون دەکرێتەوە.

---

١ تاريخ الأُمم والملوك (٤/١٤٤، ١٦٦).

٢ تاريخ الأُمم والملوك (٤/٢٤١)، الدولة الأموية (ص: ١٥٥).

٣ (معاوية) بن أبي سفيان، بسام العسلي (ص: ٤٠).

## سێهەم: ( معاویە ) ( خودا لێی ڕازی بێت ) لە سەردەمی ( عوسمانی کوڕی عەففان )دا ( خودا لێی ڕازی بێت ):

کە (عوسمان) بوو بە خەلیفە، (معاویە) والی‌و کاربەڕێوەبەری زۆربەی وڵاتی (شام) بوو، (عوسمان)یش لەسەر پۆستەکەی هێشتیەوە،[١] بە هەمان شێوە هەندێك والی تریشی لەسەر ولایەتەکانی وەك: (یەمەن‌و بەحرێن‌و مصرو غەیری ئەوانیش) هێشتنەوە، ڕووداوەکان پەرەیان سەند، ژمارەیەك هەرێم‌و ناوچە خرانە سەر وڵاتی شام‌و بەمە (معاویە) بوو بە والی ڕەهای تەواوی ئەو وڵاتە، بەڵکو بوو بە بەهێزترین‌و دەسەڵاتدارترین والیەکانی (عوسمان)، لە سەرەتای خیلافەتی (عوسمان)دا چەند والی تر هەبوون وەکو: (عومەیری کوڕی سەعیدی ئەنصاری) والی (حمص) بوو، لە بواری ڕێزو پۆستدا (بەلای عوسمانەوە) شانبەشانی (معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان) دەهاتەوە، بەڵام تووشی نەخۆشیەکی سەخت بوو خستی‌و نەیهێشت کاروباری ویلایەتەکەی ڕاپەڕێنێت، داوای لە عوسمان کرد ئەم ئەرکەی لەسەر شان لابەرێت، ئەویش لایبردو ویلایەتەکەی ئەوینشی خستە سەر ویلایەتی (معاویە)، بەمە قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی (معاویە) زیادی کردو بەرەو (حمص) کشا، کە پێش ئەو (عبدالرحمن ی کوڕی خالیدی کوڕی وەلید) والی ئەوێ بوو،[٢] بە هەمان شێوە (عەلقەمەی کوڕی موحرین)ی والی (فەلەستین) کۆچی دوایی کرد، عوسمان ئەم ویلایەتەشی خستە سەر ویلایەتەکەی (معاویە)، دوای تێپەڕینی دوو ساڵ بەسەر خیلافەتی (عوسمان)دا (خودا لێی ڕازی بێت) هەموو وڵاتی شام کەوتە ژێر دەسەڵاتی (معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان)ەوە (خودا لێی ڕازی بێت)و، ئیدی بە درێژایی دواساڵەکانی خیلافەتی عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت) تا شەهیدبوونی عوسمان بە والی ڕەهای وڵاتی شام مایەوە.[٣]

ئەو ماوەیەی (معاویە) والی شام بوو، ڕووداوو گۆڕانکاری زۆر هاتنە پێشەوە لەو وڵاتەدا، گرنگترین ناوچەکانی جیهاد بوو، لەگەڵ ئەوەداباروودۆخی نێوخۆی جێگیر ببوو (ئیسلام) تێیدا سەروەر بوو، پەلاماری بڵاوکردنەوەی ترس‌و دڵەڕاوکێی ڕۆمەکان بۆ سەری کەم ببوونەوە، بەڵام هاوسنووری (ڕۆم) بوو، (معاویە) دەرفەتی لەبەردەستدا بوو لەو ناوچە نزیکانەدا (جیهاد) بکات، لەمەولاو بە ئیزنی خودا قسەو باس لەسەر ئەوە دەکرێت، (معاویە)

---

١ تاريخ خليفة بن خياط (ص: ١٥٥).
٢ تاريخ الطبري (٥/٤٤٢).
٣ المصدر نفسه (٥/٤٤٣).

(خودا لێی ڕازی بێت) لە دوادواییەکانی خیلافەتی عوسماندا (خودا لێی ڕازی بێت) خاوەنی قورسایی سیاسەتی تایبەتی خۆی بوو لە دەوڵەتی ئیسلامیدا، کاتێك نیشانەکانی فیتنەو ئاژاوە دەرکەوتن، (معاویه) یەکێك بوو لە ڕیزی ئەو والیانەی (عوسمان) ڕاوێژی پێکردن، (معاویه) لەم کۆبوونەوەیەدا بە ژمارەیەك ڕای تایبەتەوە -کە ئاراستەی عوسمانی کردن- بەشداری کرد.[1] لەمەولا بە ئیزنی خودا قسە لەسەر ئەم بابەتە دەکەین.

**١ـ فتوحاتەکانی حەبیبی کوڕی موسلیمەی فەهری (خودا لێی ڕازی بێت):**

(حەبیبی کوڕی موسلیمەی فەهری) دیارترین سەرکردەی جیهادی سەردەمی ویلایەتی (معاویە) بوو لە وڵاتی شامدا، کاتێك ڕۆمەکان لە سەرەتای خیلافەتی عوسماندا ڕەشەسوپایان بەرەو شام هێنا، (معاویه) لە نامەیەکیدا داوای لە عوسمان کرد هێزی بۆ بنێرێت، عوسمان نامەیەکی بۆ (وەلیدی کوڕی عوقبە)ی والی (کوفە) نووسی سوپای بە هاوارەوە بنێرێت، لەو کاتەدا (وەلید) لە ئەرکەکەی ئازەربایجان ببۆوەو لە ڕێی گەڕانەوەیدا گەیشتبووە (موصل)و لەوێ نامەکەی پێ گەیشت، لە نامەکەدا ئەمە هاتبوو:

أما بعد: (معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان) بۆی نوسیوم‌و هەواڵم پێدەدات: کە ڕۆم بە ئامانجی هێرشکردنە سەر موسڵمانان گەلەکۆمەیان کردووەو، سوپایەکی گەورەیان ئامادەباش کردووە ، منیش بڕیارمدا برایەکانی (کوفە)یان بە هاواریانەوە بچن، جا هەر کە نامەکەی منت پێگەیشت‌و لەو شوێنەدا پەیامبەرەکەی من هاتەلات، پیاوێك کە بۆ خۆت لە فریادڕەسی‌و ئازایەتی‌و گورجوگۆڵی‌و ئیسلامەتیەکەیدا پەسەندی دەکەی، دەیکەی بە سەرکردەو بە (٨) یان (٩) یان (١٠) هەزار کەسەوە بۆ لای ئەوانی بەڕێ دەکەی، والسلام.[2]

جا (وەلید) لەنێو ئاپۆڕای خەڵکدا هەستایە سەرپێ‌و سوپاس‌و ستایشی خودای کردو ئەمجا وتی: أما بعد: ئەی خەڵکینە: خودا لەم لایە (ئازەربایجان)ەوە موسڵمانانی لە تاقیکردنەوەکەدا بە جوانی‌و ڕێکوپێکی دەرچواند، ئەو وڵاتەی بۆگێڕانەوە کە هەڵگەڕابۆوە، چەند هەرێمێکی تریشی بۆ فەتح کردن کە پێشدا فەتح نەکرابوون، بە ساغ‌و سەلیمی‌و دەستکەوتی زۆرەوەو پاداشتی باشەوە گێڕانیەوە، جا کەواتە هەزاران جار سوپاس بۆ پەروەردگاری جیهانەکان، ئێستا ئەمیری ئیمانداران نامەی بۆ ناردووم‌و فەرمانم پێ دەکات: کە (٨) تا (١٠) هەزارتان لێ ساز بکەم تا بە هاواری برایەکانی (شام)تانەوە بچن، ئەوە ئەوان

١ الولاية على البلدان (١/١٧٨).

٢ تاريخ الطبري (٥/٢٤٧).

خەریکە (ڕۆم) شالاویان بۆ دێنێت، –لەم بەهاوارەوە چوونەتان– پاداشتی گەورەو نەبڕاوەو خێروبێری زۆرو ئاشکرا هەیە، ڕەحمەتی خواتان لێ بێت، ئەمە (سەلمانی کوڕی ڕەبیعە)یەو سەرکردەتانەو خۆتان ساز بکەن، ئیدی خەڵك بە دەم داواکەوە هات، (٣) ڕۆژ تێنەپەڕیبوو (٨) هەزار کەس لە دانیشتوانی (کوفە) ئامادە بوون‌و دەرچوون، ڕۆیشتن تا گەیشتنە (شام)، لەوێشدا بەرەو خاکی ڕۆم، سوپاکەی شام (حەبیبی کوڕی موسلیمەی خالیدی فەهری) سەرکردەی بوو، سوپاکەی (کوفە) سەلمانی (کوڕی ڕەبیعەی باهیلی) سەرکردایەتی دەکرد، هێرشێکی بەربڵاویان کردە سەر خاکی ڕۆم، خەڵکێکی زۆریان دەستگیر کرد، تاڵان‌و دەستکەوتێکی زۆرو زەوەندیان گرت‌و بە هۆیەوە قەڵای زۆریان فەتح کردن،[1] (حەبیبی کوڕی موسلیمە)ی سەرکردە شارەزای فێڵی جەنگی بوو، بڕیاری خۆی یەکلاکردەوە شەو بەسەر (مۆریان)ی سوپاسالاری ڕۆمەکاندا بدات، (ئومو عبدالله ی کیژی یەزیدی کەلبیە)ی هاوسەری گوێی لە قسەکانی دەبێت بە (حەبیب) دەڵێت: لە کوێت ببینمەوە؟ دەڵێت: تاوڵە لە لۆکە چنراوەکەی (مۆریان) یان بەهەشت...

ئەمجا شەو بەسەری دادان‌و بەسەریاندا زاڵ بوو، هاتە لای تاوڵەکەی (مۆریان)، تەماشای کرد هاوسەرەکەی لەوێ ڕاوەستاوەو پێشی داوەتەوە.[2] ئەمەو (حەبیب) جیهادی نەپساندەوەو لەسەر سەرکەوتنە یەکلەدوا یەکەکانی لە ئەرمینیاو ئازەربایجان بەردەوام بوو، بە جەنگ‌و بە صوڵح فەتحی کردن.[3]

(حەبیبی کوڕی موسلیمەی فەهری) دیارترین‌و سەرکەوتووترین سەرکردەی جەنگی بوو لەنێو ئەو سەرکردانەی جەنگیان لەگەڵ (ئەرمینیای بێزەنتی)دا کرد، یەك لە تاقمە سوپای دوژمنی سەرتاپا لەنێو بردو، ژمارەیەکی زۆری شارو قەڵا گرتن.[4] هەروەك چۆن لە هێڵەکانی پێشەوەی تەماسی دوژمنی نێوان ڕۆم‌و جزیرەی عێراقدا جیهادی کردو دەستی بەسەر ژمارەیەك قەڵای وەکو (شمشاط و مەڵتیەو هی تریشدا) داگرت.[5]

---

١ تاريخ الطبري (٥/٢٤٧)، عثمان بن عفان، للصلابي (ص: ١٨١).

٢ تاريخ الطبري (٥/٢٤٨).

٣ الدولة الإسلامية في عهد الخلفاء الراشدين، حمدي شاهين (ص: ٢٥٢).

٤ حروب الاسلام في الشام في عهود الخلفاء الراشدين (ص: ٥٧٧).

٥ عثمان بن عفان، للصلابي (ص: ٢٠٥).

**٢ــ جەنگو جیهادە وشکانییەکانی (معاویە) لەسەردەمی (عوسمان)دا:**

معاویە (خودا لێی ڕازی بێت) دەرکی بەوە کرد کە تەنهاو تەنها لە ڕێی خێراکردنو ڕێکوپێککردنی چالاکیە جیهادیەکانو درێژەپێدانی غەزا لە دژی ڕۆمەکان لەسەر سنوورو سەنگەرەکانی پێشەوە (شامو جزیرە)[1] ەو دەتوانێت بەر بە مەترسیو هەڕەشەو هێرشەکانی ڕۆم بگرێتو کەمیان بکاتەوە، لەبەر ئەمە ئەم سەرسنوورو سەنگەرانەی پڕکردن لە پاسەوانو سەنگەرنشینو بە بەردەوامی ئاوەدانی کردبوونەوە، لەم پێناوەدا کاتێکی درێژخایەنو کارو کوشتارێکی یەجگار زۆری لە ماوەی والیایەتی خۆی لە سەردەمی خیلافەتی (عوسمان)دا پێشکەش کرد، لە ساڵی (٢٥) کۆچیدا (معاویە) هاتوچۆیەکی سەربازی بەسەر سنوورو سەنگەرەکانی پێشەوەی شامدا کرد، قەڵاکانی نێوان (ئەنتاکیەو تەرسوس)ی بە چۆڵی بینین، تا لە غەزاکانی گەڕایەوە کۆمەڵە سەربازێکی خەڵکی (شامو جزیرەو قنسرین)ی لێ بەجێهێشتن، ساڵێك یان دوو ساڵ دوای ئەمە (صائفة=هاوینە غەزایەکی) لە خاکی ڕۆم بە (یەزیدی کوڕی حوڕی عەبەسی) کرد، (معاویە) فەرمانی پێکرد بە هەمان شێوەی ئەو قەڵاو سەنگەرە سنوورەکانی بە سەرباز بگرێت ئەمجا هێرش بەرێتە نێو خاکی دوژمن، والیەکانی دوای ئەویش ئەمەیان دەکرد.[2]

لە ساڵی (٣١)ی کۆچیدا لە باری (مەسیسە)وە چوو بۆ غەزاو گەیشتە (دروڵیە)،[3] کاتێك دەرچوو بە هەر قەڵایەکی نێوان ئەوێو (ئەنتاکیە)دا ڕەت بووایە دەیڕووخاند،[4] هەمان دەستوریشی بەسەر سەنگەرو قەڵا سنووریەکانی (جزیرە)دا جێبەجێکردو لە بایەخپێداندا

---

١ سەنگەرە سووریەکانی پێشەوەی (شامو جزیرە): بریتی بوو لەو هێڵە تەماسە دوورو درێژەی سەر سنووری باکوری دەوڵەتی ئیسلامی لەگەڵ دەوڵەتی بێزەنتیو بە ژمارەیەك قەڵاو شورەو ڕوانگە تەنرابوو، ئەم هێڵە سنووریە لە (مەڵەتیە)وە بەرەو (فوراتی ژوورو) لەوێشەوە بەرەو (تەڕسوس)ی نزیك کەناراوی دەریای ناوەڕاست درێژ دەبۆوە، ئەم هێڵە قەڵایە دەبوو بە دوو بەشی سەرەکی: یەکەمیان ناوی سنوورەکانی جزیرە بوو، بەشی باکووری هێڵەکەی پێك دەهێنا، لە گرنگترین سەرنگەرو قەڵاکانی: (مەڵەتیە، زەبتەڕە، قەڵای مەنسور، حەدەس، مەرعەش، شمشات). دووەمیان ناوی (سەنگەرە سنووریەکانی شام) بوو، بەشی باشووری خۆرئاوای هێڵەکەی پێکدەهێنا، لە گرنگترین سەنگەرو قەڵاکانی: (عەین زەربە، ئەدەنە،تەرتوس، هیرەقلە)، چیای (لوکام) بووەتە نێوانێکی سروشتی هەردووك بەشەکە. بڕوانە: أثر العلماء في الحياة السياسية في الدولة الأموية (ص: ٦٧).

٢ فتوح البلدان (ص: ٦٩).

٣ (مەسیسەو دروڵیە) لە سەنگەرەکانی سنووری (شام) بوون.

٤ فتوح البلدان (ص: ١٦٩).

خستیە پێش سنوورەکانی (شام)ەوە، هەر لە سەرەتای والیایەتیەکەیدا هەر یەك لە (حەبیبی کوڕی موسلیمەی فەهری)و (صەفوانی کوڕی موعتەلی سەلەمی) بەرەو (شمشات) بەڕێکردنو فەتحی کرد، هەروەها دوای فەتحکرانی (مەلەتیە) بە (صولح)و هەڵگەڕانەوەی، (معاویە) (حەبیبی کوڕی موسلیمە)ی بۆ دووبارە فەتحکردنەوەی ناردو ئەمجارەیان بە زەبروزەنگ فەتحی کردەوە، ژمارەیەك موسڵمانی لەگەڵ کاربەڕێوەبەرەکەی دانان، بە هەمان شێوە (معاویە) بە خودی خۆی هێرشێکی تری سەربازی کردە سەر خاکی ڕۆم، بە (مەلەتیە)دا تێپەڕیو تاکو ببێتە ڕێگەیەکی هێمنو سەلامەت بۆ هایونە غەزاکان بە پۆلێك سەربازی خەڵکی (شامو جزیرەو شوێنی تریش) قایمی کرد. هەر لە هەمان ساڵدا غەزای قەڵای (المرأة=ژن)ی لەسەر سنووری (جزیرە) ئەنجامدا،[1] مشوری لە قەڵای (حەدەس) دەخواردو شاری (مەرعەش)ی دروست کردو هێزی سەربازی لەو شارەو لە تەواوی شارو قەڵا سەر سنووریەکانی (جزیرە)دا نیشتەجێ کرد،[2] هەر کە ئەم سنوورانەی قایم کردنو لە هێرشو مەترسیەکانی دوژمن لێیانەوە دڵنیا بوو، ئەمجا چوو بۆ غەزاو خۆی بەنێو قوڵایی خاکی ڕۆمدا دەکرد، ئەمەو لە ساڵی (٣٢)ی کۆچیدا بە خودی خۆی سەرکردایەتی هێرشێکی کردو ڕۆیشت تا گەیشتە تەنگەبەری (قوسطەنتینیە).[3]

**٣ـ (معاویە) داوا لە (عوسمان) دەکات (خودا لێیان ڕازی بێت) ڕێگەی پێبدات (غەزای دەریایی) بکات:**

معاویە گرنەی لە عومەر گرتبوو مۆڵەتی پێ بدات لەڕێی دەریاوە غەزا بکات، دەهات باسی ڕۆمی بۆ دەکرد کە چەند لە (حمص)ەوە نزیکەو دەیوت: دانیشتوانی یەکێك لە گوندەکانی سەر بە (حمص) گوێبیستی حەپەجەپی سەگەکانیانو قوقەقوقی کەڵەشێرەکانیان دەبن، ئیدی هێندەی قسە بۆ عومەر کردن تا ئەوەی خەریك بوو قەناعەتی پێ بکات، بەڵام عومەر نامەیەکی بۆ (عەمروی کوڕی عاص) نووسیو پێی وتبوو: باسێکی دەریاو چۆنیەتی ڕۆیشتن بە دەریادام بۆ بکە، (عەمرو)ش بەم نووسراوە وەڵامی دایەوە: من دروستکراوێکی گەورەم بینیوە، دروسکراوێکی بچووك سواری دەبێت، کە لەنگەر دەگرێت دڵ شەق دەکات، کە دەڕوات عەقڵو هۆش دەبات، ئاستی دڵنیایی دادەبەزێنێتو ئاستی گومان بەرز دەکاتەوە، ئەو خەڵکە دەڵێی کرمۆکەنو بە قامیشەوە هەڵگەڕاون، ئەگەر

---

[1] تاریخ خليفة بن خياط (ص: ١٦٧)، فتوح البلدان (ص: ١٨٩).
[2] فتوح البلدان (ص: ١٨٧ـ١٩٦).
[3] تاريخ خليفة (ص: ١٦٧)، تاريخ الطبري (٣٠٤/٤)، أثر العلماء في الحياة السياسية في الدولة الأموية (ص: ٦٩).

کەشتیەکە لاربێتەوە نوقوم دەبێت، کە ڕاست بڕوات وەك بریسو دەڕوات‌و دەربازی دەبێت، جا کە (عومەری کوڕی خەتتاب) نامەکەی (عەمرووی کوڕی عاص)ی خوێندەوە، یەکسەر بۆ معاویەی نووسی: ناو نەخێر، سوێند بەو زاتەی (محمد)ی بە هەق ڕەوانەکردووە، هیچ موسڵمانێك نانێرمە ناو دەریاوە، قەسەم بە خودا موسڵمانێك بە لامەوە لە ڕۆم‌و ئەوەی لەخۆی گرتووە خۆشەویستترە، جارێکی تر پێشنیازی ئەمە نەکەی.[1]

بەڵام ئەم فکرە لە مێشکی (معاویە) دەرنەچووو ئەو ڕایەی لەسەری بوو هەر لەسەری مایەوەو هەمیشە چاوی بڕیبووە وڵاتەکەیان‌و فەتحکردنی، کاتێك کاروباری خیلافەت کەوتە بەردەستی (عوسمان)، (معاویە) هاتە لای عوسمان‌و وەکو عومەر بە ڕژدی داوای لە ئەویش کرد ڕێگەی پێ بدات لە ڕێی دەریاوە بۆ غەزای ڕۆم بچێت، عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت) بەم وتەیە وەڵامی دایەوە: ئەو کاتە داوای مۆڵەتی جەنگی دەریاییت لە عومەر کرد، ئاگام لێ بوو عومەر چۆن بەرپەرچی دایەوە.

ئەمجا جارێکی تر (معاویە) نامەیەکی بۆ (عوسمان) ناردو تێیدا چوونە نێو دەریای لەبەر چاو ئاسان دەکردو داوای لێ دەکرد ڕێی پێ بدات لە ڕێی دەریا ڕادەست بکات، عوسمان بۆی نووسیەوە: بەو مەرجەی ژنەکەت لەگەڵت بێت‌و سواری کەشتی بێت، دەنا ڕێگەت پێ نادەم،[2] ئەمەو عوسمانی خەلیفە مەرجێکی تریشی بەسەردا دابوو وەك دەڵێت: خەڵك هەڵمەبژێرەو تیرو پشکیان لەنێودا ئەنجام مەدە، هەر کەسێك بە خۆشی خۆی ئامادە بوو، لەگەڵ خۆتی بەرەو کۆمەکیشی بکە.[3]

هەرکە (معاویە) نامەکەی عوسمانی خوێندەوە یەکسەر خۆی بۆ چوون بەرەو (قوبرس) گورج‌و گۆڵ کرد، نامەی بۆ خەڵکانی کەنارنشین نارد کەشتی‌و بەلەمەکانیان چاك بکەنەوەو لە کەناری (عەکا)یان نزیك بکەنەوە، ئیتر بڕیاری خۆی لەسەر بەرێکەوتن بەرەو (قبرص) ساغ کردەوە.[4]

### ٤ـ جەنگی قوبرس:

(معاویە) کەشتی زیاد لە پێویستی بۆ هەڵگرتنی سوپای غەزاکەر سازکردن، بەندەری (عەککا)ی کردە مەڵبەندی تێدا دەرچوونی سوپاکەی، (فاختەی کچی قورەزە)ی هاوسەری

---

١ تاريخ الطبري (٥/٢٥٨).
٢ الادارة العسكرية في الدولة الاسلامية (٢/٥٣٨).
٣ تاريخ الطبري (٥/٢٦٠).
٤ الادارة العسكرية في الدولة الاسلامية (٢/٥٣٨).

لەگەڵ خۆیدا سوارکرد، (عوبادەی کوڕی صامت)یش (ئومو حەرامی کچی مەلحان)ی هاوسەری لەگەڵ خۆیدا برد.[١] بەڵێ: (ئومو حەرام)ی خاوەن چیرۆکە بەناوبانگەکە، لە (ئەنەسی کوڕی مالیکەوە) (خودا لێی ڕازی بێت) پێغەمبەری خودا (ﷺ) سەردانی (ئوموحەرامی کچی مەلحان)[٢]ی دەکرد، ئەویش میوانداری دەکردو خواردنی بۆ دادەنا، (ئومو حەرام) هاوسەری (عوبادەی کوڕی صامت) بوو، ڕۆژێك پێغەمبەری خودا (ﷺ) چووە ماڵیان، ئەویش خواردنی لەبەردەم داناو پێغەمبەر (ﷺ) تێردەخوات‌و ڕادەکشێت، (ئومو حەرام) دێت لە پشت سەر(ی موبارەکیەوە) دادەنیشێت‌و سەری پیرۆزی دەپشکنێ، پێغەمبەری خودا (ﷺ) خەوت، ئەمجا بە پێکەنینەوە بە خەبەر هات، (ئوموحەرام) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە چ شتێك بە پێکەنینت دێنێت؟ فەرمووی: ((ناس من أمتي عرضوا علي، غزاة في سبيل الله يركبون ثبج هذا البحر ملوكاً على الاسرة، أو مثل الملوك على الأسرة)) واتە: ئێستا لە خەونمدا دیمەنی خەڵکانێکی ئوممەتی خۆمم پێشان درا غەزاکەری ڕێی خودا بوون، لەسەر پشتی دەریا دەڕۆیشتن، دەتوت پاشان‌و لەسەر قەنەفەپاڵیان داوەتەوە، (ئوموحەرام) دەڵێت: وتم: ئەی نێردراوی خودا! بۆم لە خودا بپاڕێوە لەگەڵ ئەوانم بخات، جا بۆی پاڕایەوەو سەری دانایەوەو دیسان خەوی لێکەوت، ئەمجا بە پێکەنینەوە لە خەو ڕابوو، ئومو حەرام دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا چ شتێك بە پێکەنینت دەخات؟ فەرمووی: ((ناس من أمتي عرضوا علي، غزاة في سبيل الله...)) ئیدی پێشتر چی فەرموو ئەوەی عەرز کردەوە، (ئوموحەرام) دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا بۆم لە خودا بپاڕێوە منیش یەکێك بم لەوانە، فەرمووی: ((أنتِ من الأولين)) تۆ لە یەکەمین تاقمیانی، ئەمەو (ئوموحەرامی کیژی مەلحان) لەسەردەمی معاویەدا سواری پاپۆڕی دەریا بووو کاتێك هاتەوە وشکانی لە وڵاخەکەی گل بۆوەو کۆچی دوایی کرد.[٣] هەرچەندە (معاویە) تۆبزی لە خەڵك نەکرد، بەڵام سوپایەکی گەورەی لەگەڵ دەرچوو.[٤]

---

١ البداية والنهاية (٧/١٥٩).

٢ ابن وهب دەڵێت: (ئومو حەرام) یەکێك بووە لە خوشکە شیریەکانی دایکی پێغەمبەر (ﷺ)، لەبەر ئەمە سەردانی دەکردو لە لای دەمایەوەو جاروبار سەرخەوێکی دەکرد، هەندێکی تر دەڵێن: خوشکی شیری دایکی باوکی یان باپیری بووە. سەرچاوە: (إكمال المعلم شرح صحيح مسلم) للقاضي عياض، باب: فضل الغزو في البحر (وەرگێڕ).

٣ البخاري، رقم (٢٨٧٧).

٤ جولة تاريخية في عصر الخلفاء الراشدين (ص: ٣٥٦).

ئەمە دەبێتە بەڵگە کە ئەو موسڵمانانە لەگەڵ ئەوەدا دنیا دەروازەکانی خۆی بەسەردا واڵاکردبوونو ئەمانیش دەیانتوانی بە ئارەزووی خۆیان لە نازو نیعمەتەکانی بەهرەمەند بن، بەڵام دنیا بە خۆیو ئەوەی تێیدایە لەبەر چاویان سوكو چروك بوو، بایەخیان پێ نەدەدا، بەڵکو بەم شێوەیە پەروەردە ببوون: ئەوەی لای خودایە باشترەو چاکتر دەمێنێتەوە، خودا بۆ سەرخستنی دینی خۆیو بەرپاکردنی دادپەروەریو بڵاوکردنەوەی ڕەوشتبەرزیو کارکردن بۆ سەرخستنی دینی ئیسلام بەسەر تەواوی دینەکانی تردا هەڵیبژاردوون، ئەوان باوەڕیان وایە: ئەم ئەرکە گرنگەو بەنرخە پەیامی ڕاستەقینەی ئەوانە، جیهادکردن لە ڕێی خودادا تاکە ڕێگایەکە بۆ گەیشتن بە ڕەزامەندی خودا، ئەگەر لە ئەنجامدانی ئەم کارەیانداو ڕاپەڕاندنی ئەم ئەرکەیاندا کەمتەرخەمی بنوێننو ڕۆکەون، ئەوا خودا سەرکەوتنی دنیایان لێ دەگرێتەوەو لە ڕەزامەندی قیامەتی خۆی بێبەشیان دەکات، ئەمەش زەرەرو زیانێکی ڕوونو ئاشکرایە، لەپێناوی ئەمەداو بە پەلەو هەڵەداوان لەگەڵ (معاویە) دەرچوون، بۆ خۆگەیاندنە نێو کەشتیەکان پێشبڕکەیان دەکرد، پێ دەچێت ڕیوایەتەکەی (ئوموحەرام)ی هاوسەفەریان کاری تێ کردبنو خاترجەمی کردبنو بۆ جەنگو جیهادی ڕێی خوداو بەڕاستگێڕانی فەرموودەکەی پێغەمبەری خودا (ﷺ)زیاتر هانی دابن، ئەمەو لە ساڵی (٢٨ك/٦٤٩ن)و دوابەدوای کۆتایی هاتنی وەرزی زستان لە دەریایانداو[1] لە بەندەری (عەککا)وە شامیان بەجێهێشت، –لە گەڕانەوەدا– (ئوموحەرام) ویستی سواری وڵاخەکەی بێت، ڕەویەوەو بە زەوی داداو ملی شکاندو وەفاتی کرد.[2] هەر لەو دوورگەیە ناشتیانو وەکو سومبولێك بۆ نیشاندانی ئەوپەڕی ئاستی جیهادو قوربانیدانی موسڵمانانی ئەوکات لە پێناو پەخشکردنی ئاینەکەیان بەجێیان هێشتو تاکو ئێستاشی لەگەڵ بێت گۆڕەکەی بە (مەرقەدی ژنە صالحەکە) ناسراوە.[3] (معاویە) کۆبوونەوەی بە هاوڕێکانی کرد، کە ئەمانە هەندێکیان بوو: (أبو أیوب–خالیدی کوڕی زەیدی ئەنصاری–، ئەبو دەردا، ئەبو ذەڕی غەفاری، عوبادەی کوڕی صامت، واثیلەی کوڕی ئەسقەع، عبدالله ی کوڕی بیشری مازنی، شەددادی کوڕی ئەوسی کوڕی سابت، میقدادی کوڕی ئەسوەد، کەعبولحیبری کوڕی ماتع، جەبیری کوڕی نەزیری حەزرەمی)، ئەمەو ڕاوێژیان لەنێو خۆیاندا کردو نێردراوێکی خۆیان بۆ لای

---

١ المصدر نفصسه (٣٥٦).

٢ البداية والنهاية (١٥٩/٧).

٣ جولة تاريخية في عصر الخلفاء الراشدين (ص: ٣٥٧).

دانيشتوانی (قوبوڕوس) نارد، پێی ڕاگەياندن كە ئەوان بە ئامانجی داگيركردنی دوورگەكەيان نەهاتوون،[١] بەڵكو دەيانەوێت داوەتتان بكەن بۆ دينی خوداو پاشانيش هێمنی بۆ سنوورەكانی دەوڵەتی ئيسلامی لە تەرەفی (شام)ەوە دابين بكەن، چونكە (بێزەنتيەكان) لە كاتی هێرشو پەلامارەكانياندا (قوبروس)يان دەكردە وێستگەی حەسانەوەيانو كە خۆراكيشيان بەرەو كەمی دەچوو خۆيان تێدا دەبوژاندەوە، بەم شێوەيەلەم دوورگەيەوە هەڕەشەيان لە وڵاتی شام دەكردو هەر كاتێك بيانويستايە گورزی خۆيان دەوەشاند، ئەگەر بێتو موسڵمانەكان ئاشتی لەگەڵ دانيشتوانەكەی ئەنجام نەدەنو لەو سنوورەوە لە خۆيان ئەمين نەبنو نەيخەنە ژێر دەسەڵاتی حوكومەتەكەيانەوە، ئەوا دەبێت هەر چاوەڕێ بن كە بەردەوام دەبێتە دركێك لە پشتيان هەڵدەچەقێتو دەبێتە ڕمبێك لە سنگيان ڕۆدەچێت، بەڵام دانيشتوانی دوورگەكە خۆيان بە دەستەوە نەداو ئاشتيان ڕەت كردەوەو دەروازەی وڵاتەكەيان لەسەر نەكردنەوە، بەڵكو خۆيان لە (پايتەخت)دا دامەزراندو بۆ بەرەنگاربوونەوەی موسڵمانەكانيش نەهاتنە مەيدانەوە، ئەوان چاوەڕێی هاتنی سوپای (ڕۆم)يان دەكرد بەرگريان لێ بكاتو هێرشی موسڵمانەكانيش بشكێنێتەوە.[٢]

**٥ـ خۆبەدەستەوەدانو داواكردنی ئاشتی:**

موسڵمانەكان بەرەو (قوستەنتينە)ی پايتەختی (قوبروس) بەڕێكەوتنو گەمارۆياندا، هێندەی نەخاياند دانيشتوانەكەی داوای ئاشتی كردو ژمارەيەك مەرجيان خستەڕوو، موسڵمانەكانيش ژمارەيەك مەرجيان خستەڕوو، مەرجی سەرەكی دانيشتوانی (قوبروس) ئەمە بوو كە نابێت موسڵمانەكان چوونە نێو گێژاوی شەڕو هەرا لەگەڵ ڕۆم بكەنە مەرج بەسەريانەوە: چونكە ئەوان پێيان ناوێرنو توانای جەنگو پێكهەڵشاخانی گەڵ ئەوانيان نيە.

مەرجی موسڵمانەكانيش ئەمانە بوون:

أـ هەر كاتێك هێرشبەران پەلاماری دوورگەكەياندا، موسڵمانەكان هەقيان بەسەرەوە نينو لەسەريان ناكەنەوە.

بـ دەبێ دانيشتوانی دوورگەكە موسڵمانەكان لە جموجوڵی سوپای (ڕۆم) ئاگادار بكەنەوە.

---

١ المصدر نفسه (ص: ٣٥٧).

٢ المصدر نفسه (ص: ٣٥٧).

ج- دەبێ دانیشتوانی دوورگەکە ساڵانە (٧٢٠٠) دینار بدەن بە موسڵمانەکان.

د- موسڵمانەکان لە کاتی پەلاماردانی دوژمنیان بە دوورگەکەدا تێدەپەڕن.

س- هەر کات ڕۆمەکان هێرشیان هێنایە سەر وڵاتی ئیسلام نابێت دانیشتوانی دوورگەکە هاوکاریان بکەن‌و نهێنی موسڵمانەکانیان بۆ ئاشکرا بکەن.[1]

ئەمجا موسڵمانەکان بەرەو (شام) گەڕانەوە، بەم پێشڕەوییەیان سەلماندیان کە توانای چوونە نێو پانتایی دەریاو جەنگی نێو دەریایان هەیەو دەرفەتێکی باشیش بوو بۆ خۆڕاهێنان‌و مەشقکردن لەسەر چوونەنێو ئەم جۆرە جەنگانەی دوژمنێکەوە کە هەمیشە خۆی بۆ لە کەمیندا مەڵاسداون‌و بە نیازە هێرش بکاتە سەر وڵاتی شام‌و ئەسکەندەرییە ـی مصر ـ.[2]

**٦- ( عبدالله ی کوڕی قەیس )ی سەرکردەی کەشتیرانی ئیسلامی لە ( شام ):**

معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان (عبدالله ی کوڕی قەیسی جاسی)ی هاوپەیمانی (بەنی فەزارە)ی کردە سوپاسالار ی هێزی دەریایی، ئەمەو (عبدالله )پەنجا غەزای زستانەو هاوینەی لەڕێی دەریاوە ئەنجامدان، لە خودا دەپاڕایەوە سەربازەکانی لە میانەی هێرشەپارتیزانیەکانیاندا ساغ‌و سەلامەت بکات‌و بە لەدەستدان یان زیانپێگەیشتن بە هیچ کامێکیان تاقی نەکاتەوە، ئیدی پاڕانەوەکەی قبوڵ بووو لەم ماوە دوورودرێژەدا تەنانەت نە سەربازێك خنكا، نە کەس هەڵەنگوت، لەسەر نزاکەی بەردەوام بوو تا ئەو کاتەی ویستی خودا لەسەر تووشبوونی خۆی بە تەنها هاتەدی، ڕۆژێك بە مەبەستی ئاگاداربوون لە هەست‌و خوستی دوژمن لە ناوچەکە سواری بەلەمەکەی دەبێت، دەڕوات تا لە بەندەری ڕۆم دەگیرسێتەوە، ژمارەیەك سواڵکەری بێ دەرەتان لەوێ دەبن، خێرێکی باشیان پێ دەکات، یەك لە سواڵکەرەکان پیرەژنێك دەبێت، بە پەلەو هەڵەداوان دەگەڕێتەوە گوندەکەی خۆی، بانگی پیاوەکان دەکات‌و دەڵێت: ئیشتان بە (عبدالله ی کوڕی قەیس) نیە؟ وتیان: ئەو لە کوێیە؟ وتی: لەسەر بەندەرە، وتیان: ئەی شەیتان! عبدالله ی کوڕی قەیس لەکوێ دەناسی؟! بۆڵەبۆڵی بەسەردا کردن‌و ، وتی: ئێوە زۆر لەوە دەستەپاچەترن (عبدالله) خۆتان لێ بشارێتەوە، ئەوانیش گەلەکۆمەیان لێ کردو ڕۆیشتن‌و پەلاماریان دا، ڕووبەڕوویان بۆوەو شەڕێکی چاکی لەگەڵ کردن‌و بە تەنها تووش بووو کوژرا، کەشتیرانەکەی ڕایکردو

---

١ تاريخ الطبري (٥/٢٦١).

٢ جولة تاريخية في عصر الخلفاء الراشدين (ص: ٣٥٨، ٣٥٩).

سواری بەلەمەکە بووو گەڕایەوە لای هاوەڵەکانیو ئاگاداری کردنەوە، ئەوانیش بە سەرکردایەتی (سوفیانی کوڕی عەوفی ئەزدی) بۆیان چوونو لەگەڵیان کەوتنە جەنگەوە، (سوفیان) تەنگاو بووو گاڵتەی بە هاوڕێکانی دەکردو قسەی پێ دەگوتن، کەنیزەکەکەی (عبداللە) وتی: هاوار بۆ (عبدالله) کە دەکەوتە جەنگەوە ئاوای نەدەوت! سوفیان وتی: ئەو چۆن بووو چی دەوت: وتی: خۆی بەنێو شەپۆلی شەڕەشمشێردا دەکردو ئەمجا لە لایەکەوە خۆی بۆ دەردەخستینەوە، موسڵمانەکان (لەو ڕۆژەدا) تووشی زەبرو زەنگ هاتن، ئەمە دواخاڵی سەردەمی سوپاسالاری (عبداللە ی کوڕی قەیسی جاسی) بوو،[1] دەڵێن: لە پیرەژنەکە پرسیار کرا: چۆن (عبدالله)ت ناسی؟ وتی: پێشدا بە (بازرگان) دەچوو، کە سواڵم لێکرد، چەشنی (پاشا) دەستگرۆیی کردم، جا بۆم دەرکەوت کە ئەمە (عبداللە ی کوڕی قەیس)ە.[2]

بەم شێوازە: کاتێك خودا ویستی نیعمەتی شەهادەت بەم سالارە مەزنە ببەخشێت، بارودۆخێکی وا لەباری بۆ شەهیدبوونەکەی ڕەخساند کە تۆزقاڵێك زیان بە ناوو ناوبانگی هێزە دەریاییەکانی ئیسلام نەگات، ئەو لە حاڵێکدا بوو کە دەیەویست چاودێری دوژمنەکانی بکاتو زانیارییان لەسەر وەربگرێت، دەبینین پیرێژنێکی دنیادیدەی بیرتیژو قوڵی ئەو وڵاتە ئەو لە ڕەنگو ڕواڵەتی بازرگانێکی ئاسایی بێگانەدا دەبینێت، بەڵام تێبینی ئەوەش دەکات کە بەخشینی ئەم جیاوازەو بەبەخشینی پاشاو سەرکردەی مەزن دەچێت، زیاتر سەرنجی دەداتو نیشانەکانی سەرکردەیی تێدا دەخوێنێتەوە، جا بۆی دەرکەوت کە: ئەمە خودی ئەو سوپاسالارەیە کە جەنگاوەرانی وڵاتەکەی زەبوون کردوونو بەزاندوون، بەڵێ بەم شێوەیەو تاکو خودا بڕیارو بەڵێنی قەڵەملێدراوی خۆی بێنێتەدی، کاریەوە گەیشت دەرکەوتنی نیشانەکانی سەرکردەییو خودی خێرو دلۆڤانیو دەستگرۆیی ئەو ـکە هەیبووە لە بەرانبەر خەڵکانی نەدار تا بە نەدارانی کافریش ڕادەگات ـ دەبنە هۆکاری ناسینی خۆیو پلەوپایەکەیو دەرەنجام هێرشی دەکرێتە سەرو شەهادەتی بە نسیب دەبێت.

سەرکردەکانی ئیسلام بە مەبەستی بەدەستهێنانی دەستکەوتو سەرکەوتنی گەورە بە دەستی خۆیانو، تا ببنە پێشەنگی چاکی خەڵکانی دوای خۆیان، ئا ئەوا خۆیان دەکەن بە نموونەی بەرزی فیداکاری، بە خودی خۆی دەچێت ئەرکی کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر

---

١ تاريخ الطبري (٥/٢٦٠).

٢ المصدر نفسه (٥/٢٦٠).

دوژمـن ئـەنجام دەداتو ئـەم کـارە بـە سـەربازەکانی ناسـپێرێت، هەرچـەندە دەیزانـی لـەم خۆتەنهاکردنەداو لە کاتی ڕاپەڕاندنی ئەم ئەرکەیدا پیێ دەچێت لەگەڵ دوژمـن دەرگـیر بێـتو بە دەستی ئەوان لـەنێو بـچێت، بـەڵام گـوێی نەدایـەو خـۆی بـەنێو جەرگـەی دوژمنـدا کـردو دەستبەکار بوو، ئەمجا دەبینین چۆن بە ڕەوشتە بەرزەکانی ئیسلام ڕازاوەتەوە ئـاوا خـۆی دەخاتە ڕووو ڕەفتـاری دڵۆڤانـەی لـە بەرانبـەر نـەدارو لاوازو ژنـانی دوژمنانیـدا دەنوێنێتو بەوپـەڕی سـۆزو بەزەییـەوە دەسـتی یارمـەتیان بـۆ درێـژ دەکـاتو ئـەو پـارەو سـامانەیان بەسەردا دابەش دەکات کە بەنرخترین شـتە بـە لای خەڵکـەوە، پـێش ئـەوەش دەبیـنین کـە چەند بە ئارامو نەرم نیانە لەگەڵ هاوڕێکانیداو خۆی بە زل نەدەگرتو گرژو توندو تیژ نـەبوو لەبەرانبەریاندا، کە دەکەوتنە چـڕەدووکەڵی تینـەوە، لۆمـەو سەرزەنـشتی نـەدەکردنو هـیچ خۆی سەغڵەت نەدەکردو سەری لە خۆ تێك نەدەداو پەلەقاژەی نەدەکرد، بەڵکو خـۆی فـڕێ دەدایە نێوجەرگەی جەنگەوەو تا دنیـای لێ ڕوون نەکردبانایـەوەو سـەرکەوتنی بـۆ مـسۆگەر نەکردبانایە نەدەهاتە دەرەوە، بەڵام دەبینین کە (سوفیانی ئەزدی)ی جێنشینی بە حـوکمی کەم ئەزموونی‌و تازەبوونی لەم بوارەدا چـۆن دەکەوێتـە هاتوهـاوارو پەلـەقاژەوەو خـۆی بـە سەرزەنـشتکردنی هاوڕێکـانی خـەریك دەکـات، دەبـێ ئـەوەشمان لـە یـاد بێـت: هەرکـە کارەکەرەکەی (عبدالله ی کوڕی قەیس) لە شێوازە لێزانەکەی ئەمیرەکـەی لـە سـەرکردایەتی کردندا ئاگاداری دەکاتەوە، یەکسەر شوێن پێـی ئـەو هەڵـدەگرێتو پـەیڕەوی لێ دەکـات، لـە بەرانبەر بیستنی وشەی هەق (ئەگـەر لـە قەرەواشێکیـشەوە دەرچـێت) خـۆی بـە زل نیـشان نادات، ئەمە نموونەیەکە لە وێنەی ئەو مرۆڤانەی بـەرگی هـەواو هەوەسـیان لـەخۆ داڕنیبـوو، ئەم ڕەوشتە مەزنە بە زۆری لە نەوەی یەکەمی ئیسلامدا ڕەنگی دابۆوەو بە هۆیەوە فتوحاتە گەورەو بەرفراوانەکان هاتنەدی‌و والی‌و سەرکردەکان لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی ئوممەتـدا سەرکەوتوو بن، تەماشـا خـودا کـارو چـالاکی ئـەم نەوەیـەی چـەندە بەرهەمـدارو بـە پیـتو بەرەکەت کرد، چـەندە ناویـان دێـتو بـەڕێزو قـەدرەوە باسـیان لێـوە دەکرێـتو، چـەند لـە بەرانبەر ستەمگەرانی سەر زەمیندا ئازاو بە هەڵمەت بوونو، چەندە لە بەرانبـەر چەوسـاوەو هەژاراندا بە سۆزو بەزەیی بوونو، دەستی میهرەبانیان بەسەردا دادەهێنان.[١]

---

١ تاريخ الاسلامي (١٢/٤٠٢).

**٧ـ قوبرسیەکان ئاشتینامەکە هەڵدەوەشێننەوە:**

ساڵی (٣٢)ی کۆچی دانیشتوانی (قوبرس) بە مەبەستی ناچارکردنیان بۆ یارمەتیدانی سوپای ڕۆم بە کەشتیەکانیان بۆ هەڵمەت بردنە سەر جیهانی ئیسلام گوشارێکی توندیان لە لایەن ڕۆمەوە کەوتەسەر، دەرەنجام قوبرسیەکان گەردنکەچیان بوونو صولحەکەیان تێکدا، (معاویە) بەم خیانەتەی زانی، بڕیاری دا دەست بەسەر دورگەکەدا بگرێتو، بیخاتە ژێر دەسەڵاتی حوکومەتی ئیسلامەوە، ئیدی موسڵمانان هێرشێکی توندیان کردە سەر دوورگەکەو کوشتیانو گرتیانو بردیان، بە جۆرێك سوپای (معاویە) لە لایەکەوە هێرشی بردو سوپای ژێردەستی (عبدالله ی کوڕی سەعد)یش لە لایەکی ترەوە هەڵمەتی برد، خەڵکێکی زۆریان لێ کوشتو ژمارەیەکی زۆریشیان لێ گرتنو دەستیان بەسەر سامانێکی بێ شوماردا گرت،[١] ئەمەو حوکمڕانی (قوبروس) لە ژێر گوشاری زەبروزەنگی هێزەکانی سوپای ئیسلامدا خۆی ڕادەستی موجاهیدان کردو لێیان پاڕایەوە وازیان لێ بێننو ئاشتیان لەگەڵ ئەنجام بدەن، (معاویە) لەسەر حیسابی ئاشتینامەی یەکەم هێشتنیەوە،[٢] ئەمجارە (معاویە) نەیوێرا بە تەنها بەجێیان بهێڵێت، بۆیە بە مەبەستی سەنگەرنشینیو پاسەوانی کردنی دوورگەکەو بەرپەرچدانەوەی هێرشو پەلامارەکانی دوژمنو چەسپاندنی هێمنایەتی ناوچەکەو بەرگرتن لە هەڵگەڕانەوە لە موسڵمانان سوپایەکی (١٢) هەزاری ناردە ئەوێو تاقمە سەربازێکی لە (بەعلەبەگ)ەوە بۆ لا ناردنو شارێکی بۆ دروست کردنو مزگەوتیشی تێدا دروست کردو خواردنی تەواویشی بۆ دابین دەکردن، بارودۆخ بەم شێوەیە درێژەی کێشا ، دوورگەکە ئارام بووو موسڵمانانیش لە هێرشە لەناکاوەکانی ڕۆم ئەمین بوون، موسڵمانەکان سەرنجیاندا: دانیشتوانی قوبروس توانای سەربازیان تێدا نیەو لە بەرامبەر هێرشبەراندا لاوازو دەستەپاچەن، دیسان هەستیان بەوە کرد کە: (ڕۆم) بەسەریاندا زاڵنو بۆ خزمەتی بەرژەوەندیەکانی خۆیان هەڵیان دەسوڕێنن، لەبەر ئەمە بە مافی خۆیان زانی ئەرکی پاراستنیان لە ستەمی ڕۆم بگرنە ئەستۆی خۆیانو نەیەڵن چیتر بێزەنتیەکان بەسەریاندا زاڵ بن، (ئیسماعیلی کوڕی عەییاش) دەڵێت: دانیشتوانی (قوبروس) داماوو لاوازنو (ڕۆم) بەسەر خۆیانو ژنەکانیاندا زاڵە، پێویستە لەسەرمان ستەمیان لەسەر لابەرینو پاسەوانیان بکەین.[٣]

---

١ جولة تاريخية في عصر الخلفاء الراشدين (ص: ٣٥٩، ٣٦٠).

٢ البلاذري (ص: ١٥٨).

٣ جولة تاريخية (ص: ١٥٨).

**٨ــ پەسەتترین مەخلوق بە لای خوداوە ئەوانەن سەرپێچی دەکەن:**

لـەم سـەرودەمی غەزایـەدا (ئـەبو دەرِدا) (خـودا لێـی ڕازی بێـت) تەماشـایەکی دیلـەکان دەکاتو دەگریا، ئەمجا وتی: خەڵك بە لای خوداوە چەند پەسـتو داماوە ئەگـەر سەرپێـچی بکەن، تاماشای ئەم نەتەوە بکەن، ئەوان زاڵو سەرکەوتوو بوون لە بەرانبـەر هـەر کەسـێکدا دوژمنایەتی کردبن، کاتێك سنووری فـەرمانی خـودای گـەورەیان بەزانـدو لێـی یـاخی بـوون، ئاوایان لێهات کە دەیانبینی.[١]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: (جوبەیری کوڕی نەفیر) پێی دەڵێت: لەم ڕۆژەدا دەگریەی کە خودا ئیسلامو ئەهلی ئیسلامی تێدا سەرخستووە؟ (ئەبو دەرِدا) دەڵێت: ئەیـەرِۆ بـۆ تـۆ، ئەمانە گەلێکی بە دەسەڵاتو زاڵ بوون، کاتێك گوێیان بە فەرمانی خـودا نـەدا، خـودا ئـاوای لێکردن کە دەیانبینی، خودا کۆیلەیی بەسەردا سەپاندن، هەر گـەلێکیش خـودا کۆیلایـەتیان بۆ بەرقەرا بدات دیارە خودا ترۆی کردوون، هـەر بەندەگـەلێکیش سەرپێـچی فـەرمانی خـودا بکەن دەبنە پەستترینو نزمترین کەسانێك بـە لای ئـەوەوە،[٢] ئـەم دەربرِینـەی (ئـەبو دەرِدا) بەڵگەیە بۆ ئەوەکـە نموونـەی کەسـێکی زیـرەكو بیرتیـژو شـارەزا بـووە لـە سـوننەتو ڕێو شوێنەکانی خودای باڵادەست، ئـەم هاوەڵـە ڕێـزدارە دەگریـاتو داخو خەفـەت دەخـوات بـۆ گەلێك کە خودا –بەهۆی سەرپێچیەکانیانەوە– چاوی لە ئاقار بینینـی هـەق کـوێر کـردوونو گەردنکەچی بانگەشەی هەق نەبوونو تووشیان بە تووشـی ئـەم دەرەنجامـە بـە ئـێشو ژانـە بوو، بە جۆرێك بەهۆی پابەندبوونی بـەردەوامیان بـە ناهەقـەوەو خۆبـەزلزانیان لـە بەرانبـەر هەقدا لە لوتکەی دەسەڵاتداریو سـەربەرزیەوە دابـەزینو کەوتنـە داوی خۆبەدەسـتەوەدانو زەبوونیەوە، ئەگەر ئەوان ئاقڵ بوونایەو کەمێك بیریان کردبایەوە تێدەگەیشتن کە بە چـوونە نێو ئیسلامەوە موڵكوماڵیان هەر هی خۆیـان دەبێـتو وڵاتیـان ئـاوەدان دەبێـتو لـە لایـەن دەوڵـەتی ئیـسلامەوە پاسـەوانیان لێ دەکرێـت، ئـەم بیرکردنـەوەی (ئـەبو دەرِدا) لایەکـە لـە ڕوواڵەتەکانی سۆزو بـەزەیی‌و، نەفـسی پـاكو بـەرزی دەخرۆشـێتو، لەسـەر شـێوەی ڕژانـی فرمێسك لە چاوەکانی ئەم پیاوە مەزنەوە بەدەردەکەوێتو، بەم تەرزە فکرو گریانـە تـەعبیر لە ناخی پڕبەزەییو پەرۆشـی دەکـات لـە بەرانبـەر سـەرەنجامی تفـتو تـاڵی ئـەم گەلـە کـە مانەوەی خۆی لەسەر گومرایی هەڵبژاردووەو دەسەڵاتو دارونەداری دونیـای لـە دەسـتداوەو

---

١ تاريخ الاسلامي (١٢/٢٩٦).

٢ البداية والنهاية (٧/١٥٩).

کەوتۆتە نێو چاڵی سوك‌و ڕوسیاییەوە، بەڵی موسڵمان چەندە بە موسڵمانبوونی خەڵك دڵخۆش دەبێت ئەوەندەش بە کافربوونیان‌و مانەوەیان لەسەر گومڕایی دڵتەنگ دەبێت، بە حوکمی ئەوە چاوی لەو سزا بە ئێش‌و ئازارەی دواڕۆژە چاوەڕێیان دەکات نیگەران دەبێت، جا چ جای ئەوە کە لە دنیاشدا تووشی بەندی‌و تەفروتونابوون‌و ئاوارەیی‌و کوشتوبڕۆ بووبن‌و ماڵوێرانی دونیاو دواڕۆژ بووبن.[١]

**٩ــ (معاویە) (عوبادەی کوڕی صامت) دەکاتە سەرپەرشتیاری دابەشکردنی دەستکەوتەکانی (قوبرۆس):**

عوبادەی کوڕی صامت بە (معاویە)ی وت: لە جەنگی حونەین لە خزمەت پێغەمبەری خودا (ﷺ) بووم، خەڵك سەبارەت بە دەستکەوتەکان قسەیان لە خزمەتدا دەکرد، قولەمێك کوڵکە وشتری بە دەستەوە گرت‌و فەرمووی: ((مالي مما أفاءَ الله عليكم من هذه الغنائم إلا الخمس والخمس مردود فيكم))[٢] واتە: جگە لە پێنجیەکی ئەم دەستکەوتانەی خودا بەدەست ئێوەی خستوون هیچی تر هی من نیە، پێنجیەکەکەش بۆ (بەرژەوەندی) خۆتان دەگەڕێنرێتەوە، دەی (معاویە) پارێز لە خودا بکە! دەستکەوتەکان بە هەقی خۆیان دابەش بکە، کەس لە بەشی خۆی زیاتری پێ مەدە، (معاویە) پێی دەڵێت: ئەوا تۆم کردە سەرپەرشتیاری دابەشکردنی دەستکەوتەکان، کەس شك نابەم لە شامدا لە تۆ ڕێزدارتر بێت، هەستە بەسەر خاوەنەکانیاندا دابەشیان بکەو پارێز لە خودا بکە، ئەمەو (عوبادە) بە هاریکاری (ئەبودەرداو ئەبو ئومامە) ئەم کارەی ئەنجامدا.[٣]

عوبادەی کوڕی صامت (خودا لێی ڕازی بێت) یەك لە دامەزرێنەرانی قوتابخانەی شامی بوو، عومەر (خودا لێی ڕازی بێت) بە سیفەتی (قازی‌و مامۆستا) بۆ شامی نارد، پێشدا لە (حمص) نیشتەجێ بوو، ئەمجا بۆ (فەلەستین)ی گواستەوەو سەرپەرشتی پۆستی (قەزاوەت)ی ئەوێی دەکرد، شایانی باسە ئەو یەکەمین قازی (فەلەستین) بوو، وێڕای ڕاپەڕاندنی کاروباری (قەزاوەت)، دانیشتوانەکەشی فێری (قورئان) دەکردن‌و بەم شێوەیە بەردەوام بوو تا لەوێدا کۆچی دوایی کرد.[٤] عوبادە (خودا لێی ڕازی بێت) لە هەموو بوارەکانی زانستی‌و پەروەردەیی‌و جیهادیدا بەشداریەکی بەرچاوی هەبوو لە جێبەجێکردن‌و

---

١ تاريخ الاسلامي (٢/٢٩٧).

٢ البداية والنهاية (٤/٢٥٣).

٣ الرياض النضرة (ص: ٥٦١).

٤ عبادة بن صامت، صحابي كبير وفاتح مجاهد (ص: ٨٤).

پەیڕەوکردنی سیاسەتی (خیلافەتی ڕاشیدە)، لەڕیزی دنیانەویستان بووو خۆی لەسەر زبری ڕاهێنابوو، کاتێك گەیشتە (حمص) ڕووی لە دانیشتوانەکەی کردو وتی: ئاگادار بن! دونیا کالآی بەرچاوە، دواڕۆژ بەڵێنێکی ڕاستو تەواوە، دنیا کوڕی خۆی هەنو دواڕۆژیش کوڕی خۆی هەن، ئێوە ببنە ڕۆڵەی دواڕۆژ، نەچن ببنە ڕۆڵەی دونیا، چونکە هەر دایکێك ڕۆڵەکانی خۆی بەدوای دەکەون.[١]

**١٠ــ چۆنیەتی ناکۆکی نێوان (ئەبو ذەڕو معاویە)و هەڵوێستی عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت) وەکو خۆی:**

ناحەزانی (عوسمانی کوڕی عەففان) (خودا لێی ڕازی بێت) عوسمان بەدوورخستنەوەی (ئەبو ذەڕ) (خودا لێی ڕازی بێت) بۆ (ڕەبزە) لەکەدار دەکەن، هەندێك مێژوونووس پێیان وایە: (عبدالله ی کوڕی سەبەئی داکرەش) چووەتە شامو سەردانی (ئەبو ذەڕ)ی کردووەو مەزەبی (قەناعەتو دنیانەویستیو دڵنەوازیکردنی هەژارانو واجببوونی ماڵبەخشینی زیادلەخۆ)ی تەڵقین داوەو، وای لێکردووە لێرەولەوێ ڕەخنە لە (معاویە) بگرێت، جا (عوبادەی کوڕی صامت) دەیباتە لای معاویەو پێی دەڵێت: سوێند بەو خودایەی ئەمەی بۆ لا ناردی ئەمە (ئەبو ذەڕ)ە، ئەمجا (معاویە) (ئەبو ذەڕ)ی لە (شام) دەرکرد.[٢] (أحمد أمین) هەوڵیداوە چەند خاڵێکی وێکچوو لە نێوان بۆچوونەکەی (ئەبو ذەڕ)و بۆچوونی (مەزدەکی فارسی)دا بدۆزێتەوە، دەڵێت: ڕووی هاوشێوە لەوەدا دێتە بەرچاو: کە (عبدالله ی کوڕی بەسەء) لە (یەمەن) بووەو بە (عێراق)دا گەڕاوە، فارسەکانیش پێش هاتنی ئیسلام لە (یەمەن)و (عێراق) نیشتەجێ بوون، جا پێ دەچێت (کوڕی سەبەء) ئەم بۆچوونەی لە مەزدەکیەکانی عێراق وەرگرتبێتو پاشانیش (ئەبو ذەڕ) بە نیازو باوەڕی پاکی لێیەوە وەرگرتبێت.[٣]

هەموو ئەو چیرۆکانەی سەبارەت بە (ئەبو ذەڕ) وتراونو (عوسمان)یان تێدا لەکەدار کراوە لەسەر بنەمای ڕیوایەتی (صحیح) نینو هەڵبەستراون، ئەو پەیوەندیەی نێوان (ئەبو ذەڕ)ی هاوەڵ (خودا لێی ڕازی بێت)و (دایکرەش)یش قسەی لێوە دەکرێت فری بەسەر ڕاستیەوە نیە.[٤] ئەوەی ڕاست (صحیح) بێت ئەمەیە:

---

١ الاكتفاء الكلابي (٣/٣١٠).
٢ المدينة المنورة فجر الاسلام (٢/٢١٦، ٢١٧).
٣ فجر الاسلام (ص: ١١٠).
٤ المدينة المنورة فجر الاسلام (٢/٢١٧).

(ئەبو ذەڕ) (خودا لێی ڕازی بێت) بە ویستی خۆی لە (ڕەبزە)[١] نیشتەجێ بووە، ئەو بە ئیجتیهادی خۆی لە ئایەتێك حاڵی بوو کە ڕێك پێچەوانەی تێگەیشتنی هاوەڵان (خودا لێیان ڕازی بێت) بوو لەو ئایەتە، لەسەر ڕای خۆی بەردەوام بوو، کەس پشتگیری ڕایەکەی نەکرد، لەبەر ئەمە مۆڵەتی وەرگرت بچێتە (ڕەبزە)و لەوێ نیشتەجێ ببێت، کە لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)دا هۆگری ببوو سەفەری بۆ دەکرد، ئەو بە واتای دوورخستنەوە دوور نەخرابۆوەو، دەستبەسەر نەبوو، بە حوکمی ئەوە ڕاکەی لە لایەکەوە (پەسەند)ە، (خەلیفە) تۆبزی لێ نەکرد پەشیمان ببێتەوە، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی لەسەر موسڵمانان واجب نیە کاری پێ بکەن.[٢] ڕاستترین ڕیوایەت سەبارەت بە سەرگوزشتەکەی (ئەبو ذەڕ) گێڕدرابێتەوە ئەوەیە کە (بوخاری) لە (صحیح)ەکەیدا لە (زەیدی کوڕی وەهەب)ەوە گێڕاویەتیەوە، (زەید) دەڵێت: بە (ڕەبزە)دا تێپەڕیمو بە (ئەبو ذەڕ) (خودا لێی ڕازی بێت) گەیشتم، پێم وت: چ شتێك تۆی لێرە نیشتەجێ کرد؟ وتی: لە شام بووم، منو (معاویە) لە بەرانبەر تێگەیشتنی ئەم ئایەتە ناکۆك بووین: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْأَحْبَارِ وَٱلرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَٰطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ يَكْنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٤﴾﴾[٣].
(معاویە) وتی: سەبارەت بە ئەهلی کیتاب دابەزیوە، منیش وتم: سەبارەت بە ئێمەو ئەوان دابەزیوە، ئیدی کێشە کەوتە نێوانمانەوە، سکاڵانامەیەکی لەسەر من بۆ عوسمان نارد، عوسمان بۆی نوسیم بچمە (مەدینە)، منیش چووم، دەتوت خەڵك تا ئەو کاتە نە دیویانم، نە ناسیویانمو دەهاتنو لە پرسیارانیان دەگرتم، ئەمەم بۆ عوسمان باسکرد، پێی وتم: ئەگەر ئارەزوو دەکەی خۆت بەر تەرەف بکەو لێشمان نزیك دەبی، جا ئەمەبوو منی لێرە نیشتەجێ کرد، خۆ ئەگەر کۆیلەیەکی (حەبەشی)یان کردبایە ئەمیر بەسەرمەوە گوێڕایەڵو فەرمانبەردار دەبووم.[٤] ئەم ڕیوایەتە ئاماژە بە چەند شتێکی گرنگ دەکات، لەوانە:
أ‌- (زەیدی کوڕی وەهەب) لەپێناو ساغکردنەوەی ئەو پروپاگەندانەی ناحەزانی (عوسمان) لەسەر عوسمانیان بڵاودەکردنەوە ، پرسیار لە (ئەبو ذەڕ) دەکات: ئایا عوسمان

---

١ (ڕەبدە): شوێنێکە لەسەر ڕێگای نێوان (مەککەو عێراق) هەڵکەوتووە.
٢ المدينة المنورة فجر الاسلام (٢/٢١٧).
٣ التوبة (٣٤).
٤ البخاري، ك: الزكاة، رقم (١٤٠٦).

دووری خستۆتەوە؟ یان بۆ خۆی ئەوێی هەڵبژاردووە؟ ، لە قسەکانیدا ئەم وەڵامە دێ: کە ئەو پاش ئەوە خەڵك دەوری دەدەنو سەبارەت دەرچوونی لە شام پرسیاری زۆری لێ دەکەن ئەمجا (لە مەدینە) دەردەچێت، هیچ لە دەقی ڕیوایەتەکەدا نەهاتووە کە (عوسمان) فەرمانی بەسەردا کردبێت، بچێتە (ڕەبزە)، بەڵکو بۆ خۆی هەڵیبژاردووە، ئەم وتەیەی (إبن حجر) لە (عبدالله ی کوڕی صامت)ەوە دەیهێنێت پشتگیری ئەم ڕایە دەکات، (عبدالله ی کوڕی صامت) دەڵێت: چووم بۆ لای (ئەبو ذەڕ) لە لای عوسمان بوو، جا سەری ڕووت کردو وتی: بە خوا من لەوان (واتە خەواریج) نیم، عوسمان وتی: تەنها بۆیەمان لەدوا ناردووی تا لە مەدینە ببیتە هاوسێمان، (ئەبو ذەڕ) وتی: پێویستیم بە ئەوە نیە، ڕێم پێ بدە بچمە (ڕەبزە)، وتی: باشە.[1]

ب- ئەم قسەیەی (ئەبو ذەڕ) (من لە شام بووم)، ئەم ڕیوایەتەی (أبو یعلی) لە ڕێگای (زەیدی کوڕی وەهەب)ەوە بۆمان دەگێڕێتەوە، هۆکاری نیشتەجێبوونی لە (شام) بەیان دەکات، (زەید) دەڵێت: (ئەبو ذەڕ) قسەی بۆ کردمو وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) پێی فەرمووم: ((إذا بلغ البناء (أي بالمدینة) سَلْعاً فارتحل الى الشام)) واتە: هەرکات خانووبەرە -ی مەدینە- گەیشتە (سەلع)[2] برۆ بۆ (شام)، جا کە ئاوەدانی گەیشتە (سەلع) بۆ شام چوومو تێیدا نیشتەجێ بووم.[3]

ج- چیرۆکەکەی (ئەبو ذەڕ) سەبارەت بە (سامان)، لەمەوە هاتووە، کە ئەو بە ئیجتیهادی خۆی بەم شێوەیە لەم ئایەتە پیرۆزە تێگەیشتووە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْأَحْبَارِ وَٱلرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَٰطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ يَكْنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٤﴾ يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُواْ مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ ﴿٣٥﴾﴾[4] واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە: زۆرێك لە قەشە (ی نەسرانیو) مالم(ی جوولەکە) هەن سەروەتو سامانی خەڵك بە ناڕەوا دەخۆنو خەڵك لە ڕێی خودا دەپرینگێننەوە، ئا ئەوانەی زێڕو زیو (ی زەکات) پەسمەندە دەکەنو لە ڕێی خودادا

---

١ فتح الباري (٣/٢٤٧).

٢ (سەلع) شاخێکە لە مەدینە.

٣ المدینة المنورة فجر الاسلام (٢/٢١٩).

٤ التوبة (٣٤-٣٥).

نابیەخشن، هەواڵی سزایەکی سەختیان پێ بدە، ڕۆژێك ئەم زێڕو زیوە لە ئاگری دۆزەخدا سوور دەکرێتەوەو تەوێڵ‌و تەنیشت‌و پشتی ئەوانی پێ داخ دەکرێت، (پێیان دەوترێت): ئەمە ئەو ماڵەیە (کە هی خودا بووو بەشی نەداران بوو) بۆ خۆتان کەڵەکە دەکرد، جا بچێژن تام –ی سزا– ی ئەو ماڵەی بلۆکتان دەکرد.

ئەوەی بوخاری لە (ئەبو ذەڕ)یەوە دەگێڕێتەوە دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە ئەو (موژدە=هەڕەشە)ی ئایەتەکەی بە ﴿ يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا .... ﴾ تەفسیر کردووە، ئەو بەم داخکردنە خەڵکی دەترساند، لە (ئەحنەفی کوڕی قەیس)ەوە، وتی: لەگەڵ دەستەیەك پیاوماقوڵی قورەیشی لە مزگەوتی (مەدینە)دا دانیشتبووم، پیاوێك هات: قژی سەری گژر بوو، بەرگی بەری زوور بوو، قەدو قیافەی زبر بوو، لە بەرانبەریان ڕاوەستاو سەلامی کرد، ئەمجا وتی : هەواڵی بەردی سوورکراوە بە پەسمەندەکەرانی سامان بدە، لەنێو ئاگری دۆزەخدا سووردەکرێتەوە، ئەمجا لەسەر گۆی مەمکی یەکێکیان دادەنرێت، بەنێو جەستەیدا دەڕوات تا لەسەر کرکراگە خڕەکەی دەفەی شانی دێتە دەرەوە، لەسەر کەلا خڕەکەی شانی دادەنرێت، دەڕوات، دەڕوات تا لەسەر گۆی مەمکی سەردەردێنێت، ئەو لە تاوان هەڵدەلەرزێت، ئەمجا ڕووی لێ وەرگێڕان‌و لە پەناپایەیەك دانیشت، بەدوای کەوتم‌و لە تەکیەوە دانیشتم، من نەمدەناسی‌و نەمدەزانی ئەوە کێیە، پێم وت: پێم وابێ ئەوەی وتت خەڵکەکە پێیان ناخۆش بوو، وتی: ئەوان یەك تۆز تێناگەن، (ئەبو ذەڕ) (خودا لێی ڕازی بێت) بەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) بەڵگەی دەهێنایەوە، کە دەفەرمووێت: ((ما أحبُّ أنَّ لي مثل أحد ذهباً، أنفقهُ كلهُ إلا ثلاث دنانير))[1] واتە:ئەگەر بە قەد کێوی ئوحود زێڕم هەبوایە حەزم نەدەکرد جگە لە سێ دینار هیچم لە لا بمابایەوە، هەر هەموویم دەبەخشی.

د- هاوەڵان لە (تێگەیشتنی ئایەتەکەدا) لە (ئەبو ذەڕ) جیاوازن‌و هەڕەشەکەیان لەسەر زەکاتنەدەران کورت هەڵێناوەو ئەم فەرموودەیەی (ئەبو سەعیدی خودری) دەیگێڕێتەوە دەکەنە بەڵگە، (ئەبو سەعید) وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: ((ليس فيما دون خمس أواق صدقة، وليس دون خمس ذود صدقة، وليس فيما دون خمسة أوسق صدقة))[2] واتە: کەمتر لە پێنج ئۆقیە (زیو کە دەکاتە -٢٠٠- درهەم)زەکاتی تێدا نیە، کەمتر لە پێنج وشتر زەکاتی تێدا نیە، کەمتر لە پێنج ئوسق -کە دەکاتە (٣٠٠) جام دانەوێڵە- زەکاتی تێدا

---

١ البخاري، ك: الزكاة، رقم (١٤٠٧).

٢ البخاري، رقم (١٤٠٥).

نیە، (إبن حجر) دەڵێت: وا لە فەرموودەکە دەفامرێتەوە، ئەوەی لە (پێنج) زیاد بوو زەکاتی دەکەوێتە سەر، بەم پێیە: هەر جۆرە سامانێك زەکاتی لێ دەرکرا، ئەوا هەرەشە لەسەر خاوەنەکەی لادەچێت، ئەوەی لە زەکاتەکەش زیاد بوو پێی ناوترێت (کنز).[1] لە کتێبی (عوسمانی کوڕی عەففان –خودا لێی ڕازی بێت–)داو لە بابەتی (ناکۆکی نێوان ئەبو ذەڕو معاویە)دا (خودا لێیان ڕازی بێت) بە درێژی لەسەر ئەمە دواومو بە بەڵگەی بەهێز سەلماندوومە کە عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت) (ئەبو ذەڕ)ی (خودا لێی ڕازی بێت) دوور نەخستۆتەوە، بەڵکو (ئەبو ذەڕ) مۆڵەتی لێ خواستو ئەویش ڕێگەی پێدا، بەلام دوژمنانی عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت) پروپاگەندەی نەفی کردنی (ئەبو ذەڕ)یان لە لایەن (عوسمان)ەوە ڕەواج پێداوە، لەبەر ئەمە کاتێك (غالب القطان) پرسیار لە (حەسەنی بەصری) دەکات: ئایا عوسمان ئەبو ذەڕی دەرکردووە؟ (حەسەن) دەڵێت: نا، پەنا بە خوا.[2] هەموو ئەو ڕیوایەتانەش کە دەڵێن گوایە (عوسمان) (ئەبو ذەڕ)ی بۆ (ڕەبزە) دوورخستۆتەوە، سەنەدەکانیان لاوازو لەکەدارن‌و دەقی دەربڕینەکانیشیان لەگەڵ ڕیوایەتە (صحیح‌و حەسەن)ەکان تێك ناکەنەوەو جیاوازیان هەیە، تەنها ئەوەی ڕوون‌و ئاشکرایەو ڕاستو دروستە ئەوەیە کە: (ئەبو ذەڕ) داوا لە (عوسمان) دەکات ڕێگەی بدا بچێتە (ڕەبزە)، ئەویش ڕێگەی پێدەدات،[3] بەڵکو عوسمان بە خاتری ئەوە (ئەبو ذەڕ) بکاتە هاوسێی خۆی، بە دوایدا دەنێرێت لە (شام)ەوە بۆ (مەدینە) بێتەوە، کاتێك گەیشتەجێ پێی دەڵێت: ئێمە بۆ کارێکی خێر لە دوامان ناردی، تا لە مەدینە ببیتە هاوسێمان،[4] هەروەها پێی دەڵێت: لە لای من بە، بە سەربەستی دێی‌و دەچی‌و فەرمانی کەست بەسەرەوە نابێت،[5] دوای ئەمە کێ دەتوانێت بڵێ: عوسمان نەفی کردووە؟[6] جگە لە ڕیوایەتێك کە (إبن حجر) دەیهێنێت هیچ ڕیوایەتێکی (صحیح) ئەم دوورخستنەوەیە دەرنابڕێ، ئەویش لە سەنەدەکەیدا (بەریدەی کوڕی سوفیانی ئەسلەمی) هەیە، (إبن حجر) دەربارەی دەڵێت: هێزی تێدا نیە، (ڕافیزە)یە،

---

١ فتح الباري (٢٧٢/٣).

٢ تاريخ المدينة، إبن شبَّة (ص: ١٠٣٧)، إسناده صحيح.

٣ فتنة مقتل عثمان (رضي اله عنه) (١١٠/١).

٤ تاريخ المدينة (ص: ١٠٣٦، ١٠٣٧)، إسناده حسن.

٥ الطبقات لإبن سعد (٢٢٧/٤، ٢٢٦).

٦ فتنة مقتل عثمان (١١/١).

جا چۆن ڕیوایەتێك پەسەند دەکرێت کە لە لایەن (شیعەیەکی ڕافیزەوە) دروستکرابێت‌و دژو پێچەوانەی ڕیوایەتە (صحیح‌و حەسەن)ەکان بێ؟!.[١]

ئیدی ڕافیزەکان ئەم بەسەرهاتەیان بە قێزەونترین شێوە بەکارهێناوەو بە دنیادا بڵاویان کردەوە کە گوایە: عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت) ئەبو ذەڕی بۆ (ڕەبزە) نەفی کردووە، ئەمە بوو بە یەکێك لە پاساوەکانی ئەوانەی لە فەرمانی دەرچوون‌و عوسمانیان پێ لەکەدار دەکردو پاشان گەلەکۆمەیان کردەسەر.[٢] (إبن المطهر الحلي الشيعي)ی کە لە ساڵی (٧٢٦)دا مردووە بەمە ڕەخنەی لە عوسمان گرتووەو ئەمەشی پێوە زیاد کردووە کە گوایە: (ئەبو ذەڕ) لە لایەن (عوسمان)ەوە لێدانێکی توندی بەرکەوتووە، بەڵام (شێخی ئیسلام إبن تيمية) وەڵامێکی بەهێزو تێرو تەواوی ئەم بوختانەی داوەتەوە،[٣] پێشینانی ئوممەت ئەم ڕاستیەیان دەزانی، بۆیە کاتێك بە (حەسەنی بەصری) وترا: ئەرێ (عوسمان) (ئەبو ذەڕ)ی دەرکردووە؟ دەڵێت: نا، پەنا بە خوا.[٤] ئەگەر لە لای (إبن سيرين) بوترایە: کە (عوسمان) (خودا لێی ڕازی بێت) (ئەبو ذەڕ)ی دوورخستووەتەوە، وێك دەهات‌و زۆر توورە دەبوو دەیوت: ئەو بۆ خۆی دەرچووەو، عوسمان دەری نەکردووە.[٥] هەروەکو لە ڕیوایەتە صەحیحەکەی پێشدا باسمان کرد: کە (ئەبو ذەڕ) (خودا لێی ڕازی بێت) تەماشای کرد خەڵکێکی زۆر دەورەیان لێداوەو لە پرسیارانیان گرتووە، ئیدی لە فیتنە ترسا، ئەمەی بۆ (عوسمان) باس کرد، هەر دەتوت داوا لە عوسمان دەکات ڕێی بدا دەرچێت، عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت) پێی وت: کە حەزت لێیە خۆت دوورە پەرێز بکە، تۆ نزیکی.[٦] بە هەمان شێوە (ئەبو ذەڕ) (خودا لێی ڕازی بێت) نە کەم نە زۆر بە بیروڕاکانی (عبدالله ی کوڕی سەبەء) کاری تێنەکراوەو تا ئەو ڕۆژەی وەفاتی تێدا کرد لە (ڕەبزە) نیشتەجێ بووەو نەبزواوە، خۆی لە هیچ شتێکی وا هەڵنەقورتاندووە بیخاتە فیتنەوە،[٧] یەکێك لەو فەرموودانەشی گێڕاوەتەوە کە بەر بە چوونە

---

١ هەمان سەرچاوە.

٢ فتنة مقتل عثمان (١١/١).

٣ منهاج السنة لإبن تيمية (١٨٣/٦).

٤ تاريخ المدينة، إبن شبَّة (ص: ١٠٣٧)، إسناده صحيح.

٥ المصدر السابق.

٦ البخاري، ك: الزكاة، رقم (١٤٠٦).

٧ أحداث الفتنة الأولى بين الصحابة في ضوء قواعد الجرح والتعديل (ص: ١٧٤).

نێو (فیتنە) دەگرن،[١] دوابەدوای وەفاتی ئەبوذەڕ (خودا لێی ڕازی بێت)، عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت) خاووخێزانەکەی لەگەڵ خاووخێزانی خۆی تێکەڵ دەکات،[٢] دەك خودای بەرزو مەزنو بەبەزەیی لە تێکڕای هاوەڵە چاكو پاكو خاوێنەکان ڕازی بێت.

**١١ــ تۆمەتبارکردنی عوسمان ( خودا لێی ڕازی بێت ) بە بەخشینی سامانی ( بيت المـال ) بە خزمەکانی:**

ئاژاوەچیو خەواریج بە پاڵپشتی هێرشێکی پڕوپاگەندەیی بۆش کە لە لایەن دوژمنانی ئیسلامەوە لە دژی عوسمان ڕێکخرابوو، هاتوون (عوسمان)یان بە بەخشینەوەی سامانی (بيت المال) بەسەر خزمو کەسە نزیکەکانی خۆیدا تاوانبارکردووە، ئیدی ئەم تۆمەتە خۆی خزاندووەتە نێو ڕووپەڕی کتێبەکانی (مێژوو)ەوەو ژمارەیەك لە بیریارو مێژوونووس بە پاساوی ئەمە کە ڕاستیەکی مێژووییە، هەڵسوکەوتیان لەگەڵ کردووە، بەڵام هەواڵێکی هەڵبەستراوو بێ بنەمایەو هەر هەواڵێکیش بەدەر لەم بوختانە ڕاستیو دروستی چەسپابێت لەسەر سەخاوەت نواندنی لە ئاقار خزمەکانی خۆیدا، نەك پێی لەکەدار ناکرێت بەڵکو بۆی لە ڕیزی سیفەتە شکۆدارەکانی دادەنرێت،[٣] چونکە عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت) دارای سەروەتو سامانێکی بێ شومار بوو و لە گەیاندنی سیلەی ڕەحمیشدا دەستێکی باڵای هەبوو،[٤] زۆری بەسەردا دەڕشتن، لە بەرانبەر ئەمەدا شەڕانیو ئاژاوەگێڕەکان ڕقیان لێ هەستاو داخو خەفەتیان لێ خواردو وتیان: ئەو لە (بيت المال) دەیانداتێ، عوسمان سەبارەت بەم هەڵوێستەی خۆی بەم شێوەیە وەڵامی دانەوە: وتوویانە: کە من خزمو کەسی خۆم خۆش دەوێنو سامانیان پێ دەدەم.... ئەمما خۆشویستنم بۆیان هەرگیز مەیل بە لای جەورو ستەم ناکات لەگەڵیاندا، بەڵکو مافەکانیان بۆ بە کۆڵدا دەدەم، ئەمما بەخشینم پێیان، ئەوا نە بۆ خۆم نە بۆ کەس لە خەڵکی حەڵاڵ ناکەم، من هەر لە سەردەمانی (پێغەمبەری خودا (ﷺ)و ئەبوبەکرو عومەر)دا بە لێشاو لە پوختەی سامانی خۆم دەبەخشی، کە زۆریشم دڵ پێوە بوو، ئەوە ئێستا کە بە تەمەن لە هەموو کەسوکارەکەم

---

١ المصدر نفسه (ص: ١٧٤).

٢ تاريخ الطبري (٥/٣١٤).

٣ عثمان بن عفان، للصلابي (ص: ١٤٨).

٤ فصل الخطاب في مواقف الأصحاب (ص: ٨٢).

گەورەتر بوومو گەیشتوومەتە ئاوابوونی تەمەنمو ئەوەی هەمە (لە موڵكو سامانی شەخسی) بە بنەماڵەکەمی دەسپێرم، مولحیدەکان ئەوەی وتوویانە دەیڵێنەوە؟[1]

بەڵێ (عوسمان) سامانو زەویو زارەکەی بەسەر (بەنی ئومەییە)دا دابەش کرد، بەشی هەریەك لە ڕۆڵەکانی خۆی وەکو بەشی هەریەك لەو کەسانە حیساب کرد کە پێی دەدان، لە ڕۆڵەکانی (ئەبیلعاص)ەوە دەستی پێکرد، (١٠) هەزاری دا بە هەریەکێك لە بنەماڵەی (حەکەم)و بە هەمووانیان (١٠٠) هەزاریان وەرگرت، بەم شێوەیەش دای بە ڕۆڵەکانی عوسمان، هەر بەم پێوانەیە بەشی ڕۆڵەکانی (عاصو عیصو حەرب)یشیدا.[2]

ئەم ڕیوایەتانەو چەند ڕیوایەتی تریشی لەگەڵدا بێت کە دەربارەی ئەو بڵاوبوونەوەو تەواوی ئەو فەرموودە (صحیح)انەش کە لەسەر سیفەتی بەرزو شکۆداریو سەخاوەتی ئەو هاتوونو دەیانکەنە بەڵگەو بیانوو بۆ ئەو بوختانانەی بۆی هەڵبەستراون کە گوایە زێدەڕۆیی لە خەرجکردنی (بیت المال)دا کردووەو بە لێشاو بەسەر خزمەکانیدا دابەشیوەو کەمتەرخەم بووە لە بەرانبەریدا، ئەم بوختانانە جگە لەوە چەند حیکایەتێکی بێ سەرو پێو بێ كلكو گوێن، هیچی تر نین.[3]

بێگومان هەڵسوکەوتو ڕەوشتی عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت) بەم شێوەیە لەگەڵ خزمەکانیدا، ڕوویەك لە ڕووە سۆزو بەزەییو بەخشندەو دلۆڤان(ەکانی ئیسلام) نیشان دەدات، خودای بەرز دەفەرموێت: ﴿ وَءَاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا ﴿٢٦﴾ ﴾[4] واتە: هەقو مافی خزمو هەژارو ڕێبوار بدە، نەکەی زیادەڕۆیی بکەی. بە هەمان شێوە ئەم ڕەفتارەی عوسمان لایەنێکی کرداری ڕێوشوێنی پێغەمبەری هەڵبژاردە (ﷺ)ی نیشانداوە، ئەوەی عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت) لە حاڵی پێغەمبەردا (ﷺ) بینیویەتیو زانیویەتی خەڵکانی تر نەیاندیوەو دەرکیان پێ نەکردووە، هێندەی ئەو فیقهو شارەزایی بە عەقڵو زەینی خۆی وەرگرتووەو تێی گەیشتووە خەڵکانی تر وەریان نەگرتووەو لێی تێنەگەیشتوون، ئەو تەماشای پێغەمبەر (ﷺ)ی کردووە کە چەندە خزمەکانی خۆی خۆش ویستوونو چاکەی زۆری لەگەڵ کردوون، کاتێك سامانی (بەحرێن)ی بۆ هات، ئەوەندە

---

١ تأريخ الطبري (٣٥٦/٥).

٢ تأريخ الطبري (٣٥٦/٥).

٣ الاسراء (٢٦).

٤ فصل الخطاب في مواقف الأصحاب (ص: ٨٣).

بەشەی بە (عەباس)ی مامی دا بە کەسی تری نەدا.[١] پێغەمبەریش (ﷺ) گەورەترین سەرکردەیە بۆ عوسمانو تەواوی ئیمانداران.[٢]

(ابن تيمية) بەر ڕەحمەتی خوا بکەوێت، وەلامێکی باشی ئەو کەسەی داوەتەوە کە عوسمان بە هەلبژاردنی خزمەکانی بەسەر موسلماناندا تۆمەتبار دەکاتو دەلێت: ئەو کەسە وتوویەتی: بنەماڵەو خزمەکانی خۆی هەلدەبژاردنو سامانی زۆری (بيت المال)ی پێ دەدان، تا ئەو ڕادەیەی (٤٠٠) دیناری دا بە (٤) کەسی قوڕەیشی کە زاوای بوون، هەزار هەزار (یەك ملیۆن) دیناری دا بە مەڕوان، لە وەلامدا دەوترێت: کوا بەلگەی چەسپاو لەسەر ئەمە؟ بەلێ ئەو سامانی دەدا بە خزمەکانیو بە خەلکانی تریش، خێری بە تێکڕای موسلمانان دەکرد، بەلام ئەم ئەندازە زۆرە پێویستی بە بەلگەی چەسپاو هەیە، ئەمجا دووەم جار دەوترێت: ئەمە لە ڕیزی درۆو دەلەسە ئاشکراکانە، چونکە نە عوسمانو نە خەلیفە ڕاشیدەکان نزیکی ئەو برە زۆرەیان نەداوە بە کەس!.[٣]

**١٢ــ ئایا عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت) هیچ کەسێکی لەسەر حیسابی موسلمانان دامەزراندووە:**

عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت) هیچ پۆستێکی بالای لەسەر حیسابی موسلمانان نەداوە بە هیچ کامێك لە خزمەکانی خۆی، ئەگەر ویستبای ئەمە لە بەرانبەر کەسێکدا ئەنجام بدا ئەوا (محمدی کوڕی ئەبو حوزەیفە)ی زڕکوڕی لە پێش هەموو کەسەوە بوو بۆ ئەمە، بەلام خەلیفە ئامادە نەبوو پۆستێك بدا بە کەسێك کە لێی نەوەشێتەوە، بە (محمد) دەلێت: ئەی کوڕی خۆم ئەگەر داوای هەر کاربەدەستیەکم لێ بکەیتو لەگەل لێهاتوویت بێتەوە پێت دەدەم، بەلام تۆ بۆ ئەوە نابی،[٤] ئەمە لەبەر ئەوە نەبووە کە ڕقی لێ بووبێتەوەو چارەی نەویستبێت ، دەنا ئەو هەموو سامانو بارگەی بۆ نەدەپێچایەوە لە کاتێکدا ئیزنی لێ خواست بچێتە (مصر).[٥] سەبارەت بە پێدانی پۆستەکانی کاربەدەستی بە (گەنجان) لە لایەن عوسمانەوە، دەلێن ئەو لەم ڕووەوە شوێنی پێغەمبەری خودا (ﷺ)ی هەلگرتووە، پێغەمبەر (ﷺ) لە دواژیانیدا سوپایەکی بۆ غەزای ڕۆم سازکردو (ئوسامەی کوڕی زەید)ی تازە لاوی

---

١ البخاري، ك: الجزية.

٢ البداية والنهاية (٧/٢٠).

٣ منهاج السنة (٣/١٩٠).

٤ تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة (١/٤٢٧).

٥ المصدر السابق (١/٤٢٧)، تأريخ الطبري (٥/٤١٦).

کردە سەرکردەی سوپاکە،[١] کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی فەرموو (ئەبوبەکری صدیق) (خودا لێی ڕازی بێت) سوپا سازەکەی بەڕێکرد، ژمارەیەك لە هاوەڵان حەزیان دەکرد (ئوسامە) لابرێت‌و سەرکردەیەکی باشتری بەسەرەوە دابنرێت، سەبارەت بەمە (عومەر)یان ڕاسپارد تا (ئەبو بەکر) بدوێنێت، کە گوێی لەم قسەیە بوو، تووڕە بووو بە عومەری وت: ئەی عومەر! پێغەمبەری خودا (ﷺ) دایناوە، تۆش داوام لێ دەکەی لایبەرم![٢]

عوسمان بە خودی خۆی لە بەرانبەر تاقمە هاوەڵێکی مەزندا وەڵامی ڕەخنەکانی دەداتەوەو دەڵێت: بێ لە کەسانی کامڵ‌و باڵق‌و ئاقڵ‌و سەرڕاست کەسی ترم نەکردووە بە کاربەدەست، ئەم –کاربەدەستانەی من– شیاوی پۆستەکانیانن، پرسیاریان لێ بکەن، ئەو –شۆڕشچیانە– خەڵکی وڵاتی خۆیانن، لە پێش مندا کاربەدەستی گەنجتر لەم کاربەدەستانەی من دانراون، ئەو گازندەیەی ئێستا ئاڕاستەی من دەکرێت، هەمان گازندەش ئاراستەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) کراوە، ئایا وا نیە؟ وتیان: بەڵێ ڕەخنەی وا لە خەڵکی دەگرن کە لێکی نادەنەوە،[٣] عەلی (خودا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: ئەو (واتە عوسمان) تەنها پیاوانی ڕێکوپێك‌و سەرڕاست‌و دادپەروەری دەکردن بە کاربەدەست، پێغەمبەری خودا (ﷺ) عوتتابی کوڕی ئەسیدی تەمەن (٢٠) ساڵەی کردە سەرپەرشتیاری شاری (مەککە)،[٤] هیچ کامێك لە والی وڵاتان‌و کاربەڕێوەبەری شارەکان لە سەردەمی عوسماندا لە بەرانبەر بڕگەکانی شەرعدا بێ ئاگا نەبوون‌و لە بەرانبەر (دین)دا زێدەڕۆو کەمتەرخەم نەبوون، ئەگەر گوناهیان هەبوون، ئەوا چاکەی زۆریشیان هەبوون، ئەمە لەگەڵ ئەوەدا چاکەکانیان بۆ خۆیان‌و گوناهەکانیشیان بەسەر خۆیاندا دەشکێنەوە و هیچ کاریگەری خراپیان بۆ سەر کۆمەڵگای ئیسلامی نیە، ئەگەر تەماشایەکی پەڕیزو شوێنەواری ئەو والیانەی (سەردەمی عوسمان) بکەین، دەبینین سودێکی گەورەیان بە ئیسلام‌و موسڵمانان گەیاندووە، سەدان هەزار کەس لەسەر دەستی ئەوان هیدایەتیان وەرگرتووەو موسڵمان بوون، بەهۆی فتوحاتی ئەوانەوە چەندین وڵاتی بەرفراوان خرانە سەر جیهانی ئیسلام، خۆ ئەگەر ئەوانە ئازایەتی‌و دینیان نەبوایە هەرگیز سەرکردایەتی سوپا جیهادکەرەکانیان نەدەکردو نەدەچوونە گۆڕەپانی جەنگ‌و جیهادێکەوە، کە بێگومان لە مەرگ‌و لە نێوچوونی نزیك دەکردنەوەو لە خۆشی‌و

١ تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة (١/٤٢٧)، تأريخ الطبري (٥/٤١٦).
٢ تأريخ الطبري (٥/٤١٦).
٣ تأريخ الطبري (٥/٣٥٥).
٤ البداية والنهاية (٧/١٧٨).

ڕابواردنی ژیانی دونیای دوو دەرخستنەوە، ژیاننامەی یەك بە یەکی ئەو والیانەم خوێندووەتەوە، هەر یەك لەمان فەتحێك یان چەند فەتحێکی لە سنووری وڵاتەکەی خۆیەوە ئەنجام داوە، ئەمە لەگەڵ ئەوەدا کە هەریەکەیان بە هۆی سیفەتگەلێکی ڕێکوپێکەوە شایستەی ئەو پۆستە بووە کە پێی دراوە، لە کتێبی (عثمان بن عفان –رضي الله عنه–)داو لە باسێکی سەربەخۆدا حەقیقەتی والیەکانی (عوسمان)م خستۆتەڕوو.[1] هەر کەسێك بۆ سەرچاوە ڕوون‌و پاك‌و پوخت‌و ڕاست‌و دروستەکەی ڕووداوەکانی مێژوو بگەڕێتەوەو بەدواداچوونێکی جیددی لەسەر ژیان‌و کارنامەی ئەو کەڵە پیاوانە ئەنجام بدات کە عوسمانی ئەمیری ئیمانداران‌و (ذو النورين) لە بەڕێوەبردنی خیلافەتەکەیدا پشتی پێ بەستبوون‌و تەماشایەکی جیهادو تێکۆشانەکەیان بکات کە چ پەرژین‌و شوێنەوارێکی جوانیان لە مێژووی بانگەوازی ئیسلامیدا نەخشاندووەو، تەماشایەکی کاربەڕێوەبردنە ڕێکوپێکەکەیان بکات کە چەند بەرهەم‌و خزمەتی گەورەیان لە پێناو بەختەوەرکردن‌و خۆشگوزەرانکردنی ئوممەتدا پێشکەش کردوون، ئیدی هەر کاتێك ئاوای کردو زیاتر لەسەر ئەمە توێژینەوەی کردو لە وەرچەرخانی ڕەوڕەوەی مێژووی ئیسلام ورد بۆوە، ئەوا خۆی پێ ناگیرێت کە بەم کەڵەپیاوانە سەرسام نەبێت‌و شانازیان پێوە نەکات.[2]

هەرچەندە (عوسمان)و والیەکانی بە بەرپەرچدانەوەو بەرەنگاربوونەوەی دوژمنانەوە خەریك بوون، بەڵام هەموو ئەم ئاستەنگانەیان تێکشکاندن‌و سنووری جیهانی ئیسلامیان فراوان کردو باڵی دەسەڵاتی ئیسلامیان بەسەر ژمارەیەك ناوچەی تازەتردا درێژ کرد.

والیەکانیش لە بوختان پێوەکران پارێزراو نەبوون‌و تۆمەتی دەستدرێژیکردنە سەر خەڵکیان بۆ دروست کراوەو ئەوانیش بۆ پاساوی هەڵایساندنی فتلیەی فیتنەکە لە لایەن دوژمنان‌و شۆڕشچیەکانەوە ڕۆڵ‌و کاریگەریەکی ڕاستەوخۆیان بۆ دانراوە، بەڵام هیچ ڕووداوێکی دیاریکراو بەرهەست ناکەین ئەم دەستدرێژیکردنە وەهمیە ڕەواج پێدراوانە ڕوون بکاتەوە، ئەم بوختانە کتومت بە هەمان بوختان دەچێت کە بۆ عوسمان هەڵبەسترابووو وترابوو: (عوسمان) پۆستە باڵاکانی حوکومەتەکەی دەدات بە خزمەکانی، خۆ ئەم بوختانەمان چاك پوچەڵ کردەوە، بەم شێوازە دەبینین: کە عوسمان هەرگیز لە دڵسۆزی نواندن بۆ ئوممەت‌و دانانی کاربەدەستانی شیاوو شایستەدا کەمتەرخەمی نەکردووە، لەگەڵ

---

١ عثمان بن عفان للصلابي (ص: ٢٩٤).

٢ حاشية المنتقى من منهاج الاعتدال (ص: ٢٩٠).

ئەمەشدا (عوسمان)و والیەکانی لەو تۆمەتو بوختانانەی کە لە لایەن خەڵکانی ئاژاوەگێڕەوە ئاراستەیان دەکران بە ساغی دەرنەچوون، هەروەك چۆن عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت) لە لایەن زۆرێك لە لێکۆڵەری هاوچەرخەوە بە سەلامەتی دەرنەچووەو ئەوان لە کتێبەکانیاندا سەبارەت بە سەردەمی عوسمان چەند حوکمێکی کوێرانەیان داوە، کە بە هیچ شێوەیەك پشتیان بە سەرچاوەی متمانەپێکراوو توێژینەوەی زانستیانەو بۆچوونی واقیعیانە نەبەستووە، ژمارەیەکی زۆر لەمانە هاتوون هەموو ئەو ڕیوایەتە لاوازو بێ سەنەدانەیان هێناون کە لە لایەن (شیعەی ڕافیزە)وە هەڵبەستراونو لەسەر ئەم بناغە بۆشە چەند حوکمێکی ناڕەواو ستەمکارانەیان دەرهەق بە خەلیفەی ڕاشید (عوسمانی کوڕی عەففان) هەڵچنیون. وەکو:

- (طه حسين) لە کتێبی (الفتنة الكبرى)دا.
- (راضي عبدالرحيم) لە کتێبی (النظام الاداري والحربي)دا.
- (صبحي الصالح) لە کتێبی (النظم الاسلامية)دا.
- (مولوي حسين) لە کتێبی (الادارة العربية)دا.
- (صبحي محمصاني) لە کتێبی (تراث الخلفاء الراشدين في الفقه والقضاء)دا.
- (توفيق اليوزبكي) لە کتێبی (دراسات في النظم العربية والاسلامية)دا.
- (محمد الملحم) لە کتێبی (تاريخ البحرين في القرن الاول الهجري)دا.
- (بدوي عبداللطيف) لە کتێبی (الاحزاب السياسية في فجر الاسلام)دا.
- (أنور الرفاعي) لە کتێبی (النظم الاسلامية)دا.
- (محمد الرِّيس) لە کتێبی (النظريات السياسية)دا.
- (علي حسن الخربوطلي) لە کتێبی (الملك والخلافة)دا.
- (سيد قطب) لە کتێبی (العدالة الاجتماعية)دا.

هەروەها ژمارەیەك نووسەری تریش.[1]

مێژوونووسان درێژدادڕی زۆریان کردووە لەسەر ئەوە کە عوسمان خزمەکانی خۆی زۆر خۆشویستوونو هێندەی بە دەمەوە داونو ڕێی پێداون تا دەستیان بەسەر کاروباری حوکومەتەکەیدا گرتووەو کار بەوە گەیشت خەڵکێکی زۆر ئاگری شۆڕشیان هەڵکردو لە دژی ڕاست بوونەوە.[2]

---

١ الولاية على البلدان (١/٢٢٢_٢٣٢).

٢ الدولة الأموية المفترى عليها (ص: ١٥٩).

عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت) تەنها پێنج کەس لە خزمەکانی خۆی کردبوون بە والی، ئەمانە بوون: (١ـ معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان، ٢ـ عبداللە ی کوڕی ئەبی سەرح، ٣ـ وەلیدی کوڕی عوقبە، ٤ـ سەعیدی کوڕی عاص، ٥ـ عبداللە ی کوڕی عامر)، بەڵێ ئەم پێنج کەسە خزمی بوونو پۆستی والیایەتی پێدابوونو بە بۆچوونی ئەوان ڕەخنەیەکی گەورەیەو لە عوسمانی دەگرن، خۆ ئەگەر بێتو سەرژمێریەك بکەین، ئەوا دەبینین: کۆی والیەکانی سەردەمی خیلافەتی عوسمان (٢٦) بیستو شەش دانە بوون، باشە ڕاستو ڕەوایە کە لە کۆی ئەم هەموو والیانە پێنج دانەیان لە (بەنی ئومەییە) بن؟!، بە تایبەتی کە ئەم حەقیقەتە بزانین: ئەوەندەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) کاربەدەستی لە (بەنی ئومەییە) دادەنان لە هیچ تیرەو تایەفەیەکی تر ئەوەندە کاربەدەستەی دانەدەنان؟، یا ئەوەش بزانین کە ئەم پێنج کەسانە هەموویان لە یەك کاتدا والی نەبوون، عوسمان هێشتا شەهید نەببوو کە بە خودی خۆی (سەعیدی کوڕی عاص)ی لێخست، کاتێکیش وەفاتی کرد تەنها (٣) سێ کەسی تایەفەی (بەنی ئومەییە) والی بوون، کە ئەمانە بوون:

(معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان، عبداللە ی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی سەرح، عبداللە ی کوڕی عامری کوڕی کریز)، عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت) (وەلیدی کوڕی عوقبەو سەعیدی کوڕی عاص)ی لەسەر کورسی ویلایەت دابەزاندن، بەڵام لە چ شوێنێك؟ لەو (کوفە)یەی کە عومەر سەعیدی کوڕی ئەبی وەقاصی تێدا دابەزاند، ئەو کوفەیەی کە بە هیچ والیەیەك ڕازی نەبوون، کەواتە لێخستنی ئەم دوو والیە لە لایەن عوسمانەوە خراپبوونی ئەوانی لێ نافامرێتەوە، بەڵکو هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەرهەڵدانی تاقمە کەسێکی ئاژاوەچی لەو شارەدا.[1]

کەسایەتیەکانی (بەنی ئومەییە) لە لایەن پێغەمبەری خودا (ﷺ)ەوە پۆستی کاربەدەستیان پێ دەدرا، لە لایەن (ئەبوبەکرو عومەر)یشەوە کە هیچ بۆنێکی خزمایەتی (بەنی ئومەییە)یان لێ ناکرێت، ئەمەیان پێ ڕەوا دەدیترا، هیچ تیرەیەکی نێو تیرەکانی قورەیش بە قەد تیرەی (بەنی عەبدشەمس) لەنێو دەوڵەتەکەی پێغەمبەر (ﷺ)دا کاربەدەستی زۆری نەبوون! دەزانی لەبەرچی بوو؟ چونکە بە ژمارە زۆر بووو کەسانی شکۆمەندو جوامێری تێدا هەڵکەوتبوون، پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەم چەند کەسەی نێو ئەم تیرەیەی لەم شوێنانەدا کرد بە کاربەدەست: (ئوسیدی کوڕی عاص)ی کردە کاربەدەستی

---

١ حقبة من التأريخ (ص: ٧٥).

(مەككە)، (ئەبو سوفیانی كوڕی حەرب)ی كردە كاربەدەستی (نەجران)، (خالیدی كوڕی سەعید)ی كردە كۆكەرەوەی زەكاتی (مدحج)، (ئەبانی كوڕی سەعید)ی بەسەر چەند (سریە)یەكەوە داناو پاشان كردی بە كاربەدەستی (بەحرێن).

عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت) جگە لەو جۆرە كەسایەتیانەو هاوشێوەی ئەمانە چ لە ڕەگەزدا چ لە تیرەدا كەسانی تری نەكردوون بە كاربەدەست، (ئەبوبەكرو عومەر)یش لەم بوارەدا شوێن پێی پێغەمبەری خودا (ﷺ)یان هەڵگرتبوو، (ئەبوبەكر) یەزیدی كوڕی ئەبی سوفیانی كردە سەرپەرشتیاری فەتحی شام، (عومەر)یش لەسەر كورسی ویلایەتی شامی هێشتەوە، دوای مردنیشی معاویەی برای لە جێی دانایەوە.[1] لێرەدا پرسیارێك خۆی زەق دەكاتەوە: ئایا ئەو كەسانە شایستەیی خۆیان سەلماندبوو یان نا؟ وەڵام: لە كتێبی (عثمان بن عفان–رضي الله عنه–)داو لە توێژینەوەیەكی زانستیانەدا دەرم خستووە كە والیەكانی عوسمان بە تایبەتی والیە خزمەكانی شایستەیی‌و توانای ئیداری خۆیان لە ماوەی بەڕێوەبردنی كاروباری وڵاتەكانیاندا سەلماندبوو، خودا (جل جلالە) وڵاتانێكی زۆری لەسەر دەستی ئەوان فەتح كرد، ئەوانیش بەوپەڕی دادپەروەرانەو چاكەخوازانە لەگەڵ ڕەعیەتدا هەڵسوكەوتیان كرد.[2] بۆ وێنە (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) خوڵقوخوو ئاكاری لەگەڵ ڕەعیەتدا تا بڵێی لەبار بووو لە ڕیزی پێشەوەی والیە چاكەكان بووو بە هۆی هەڵسوكەوتی باشیەوە ڕۆژ بە ڕۆژ خەڵك زیاتریان خۆش دەویست، لە فەرموودەی (صحیح)دا چەسپاوە كە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: ((خیار أئمتكم الذین تحبونهم ویحبونكم، وتصلون علیهم ویصلون علیكم، وشرار أئمتكم الذین تبغضونهم ویبغضونكم، وتلعنونهم ویلعنونكم))[3] واتە: چاكترین كەسانی حوكمڕانتان ئەوانەن: كە خۆشتان دەوێن‌و خۆشیان دەوێن، نزای چاكیان بۆ دەكەن‌و نزای چاكتان بۆ دەكەن، خراپترین كەسانی حوكمڕانیشتان ئەمانەن: كە ئێوە ڕقتان لێ دەبنەوەو ئەوانیش ڕقیان لە ئێوە دەبێتەوە، ئێوە نەفرینیان لێ دەكەن‌و ئەوانیش نەفرینتان لێ دەكەن.

قازی (إبن العربي) ڕوونی كردۆتەوە كە پێغەمبەری خودا (ﷺ) كردوویەتی بە كاتبی خۆی، پاڵپشتی پۆستی (كاربەدەستی) كەس لە دەوڵەتی ئیسلامیدا نە لە پێش خۆیدا نە لە

---

١ منهاج السنة (٣/١٧٥، ١٧٦).
٢ تحقیق مواقف الصحابة من الفتنة (١/٤١٧).
٣ مسلم، ك: الامارة، رقم (٦٥).

دوای خۆیەوە وەكو هی ئەو نەبووە، بە جۆرێك: پێغەمبەری خودا (ﷺ)و هەرسێك خەلیفەی دوای خۆی لەسەر پۆستی كاربەدەستیەكەی كۆك بوونو ڕێككەوتوون، ئەمجا (حەسەنی كوڕی عەلی كوڕی ئەبوتالیب) لەگەڵی پێكهاتو دانی بە (خیلافەت)یدا هێنا.[١]

**١٣ــ هۆكارەكانی فیتنەی كوژرانی عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت):**

(الزهري) دەڵێت: عوسمان دوانزە ساڵ ئەمیرایەتی ئیماندارانی كرد، شەش ساڵی یەكی ئەو ماوەیە كەس ڕەخنەی نەگرتو لێی نیگەران نەبوو، ئەو لە عومەر خۆشەویستتر بوو بە لای قورەیشەوە، چونكە عومەر لەگەڵیان توند بوو، بەڵام عوسمان نەرمی بۆ نواندنو سیلەی ڕوحمی لە بەرانبەردا جێبەجێكردن، پاش ئەمە فیتنەكە سەری هەڵدا، مێژوونووسان ڕووداوەكانی نیوەی دووەمی سەردەمی عوسمان (٣٠ــ٣٥ك)یان بە ئاشوبو فیتنە ناوبردووە، ئەو ئاشوبەی سەری كێشا بۆ شەهیدبوونی خودی عوسمانی خەلیفە (خودا لێی ڕازی بێت)،[٢] موسڵمانان لە ماوەی خیلافەتی ئەبو بەكرو عومەرو چەند ساڵێكیش لە خیلافەتی عوسمان یەكگرتوو بوونو هیچ كێشەیەكیان لەنێودا نەبوو، ئەمجا لەدوادواییەكانی خیلافەتی عوسماندا چەند شتێك سەریان هەڵداو جۆرێك لە ناكۆكیو پەرتەوازەییان دروست كرد، چەند كەسێك لە خەڵكی ئاشوبگێڕو ستەمكار ڕاپەڕینو (عوسمان)یان كوشت، ئەمجا موسڵمانان پەرتەوازە بوون.[٣]

كۆمەڵگای ئیسلامیی سەردەمی (صدیقو فاروق)و نیوە یەكەمی خیلافەتی (عوسمان) بەم چەند نیشانانە خۆی دەنواند:

ـ بە گشتی كۆمەڵگایەكی موسڵمانی تەواو عەیار بوو، ئیمانێكی تۆكمەی بە خودای بەرزو ڕۆژی دوایی هەبوو، ئیسلامی وەكو دەستوور جێبەجێ كرد، پابەندبوونی توندوتۆڵی خۆی بە دینەكەیەوە لە مەیدانی ژیانیدا سەلماند ـ بە بەراورد لەگەڵ كۆمەڵگاكانی مێژوودا ـ كەمترین ئەندازەی گوناهو تاوانی لێ دەركەوتووە.

ـ بەرزترین ئاستی ڕاستەقینەی (ئوممەت)ی بۆ خۆی تۆمار كرد، ئوممەتێكی ڕەببانیی خودادۆستی خوداپەرستی وا: چاوی لە ڕاست هەموو ئیعتیباراتەكانی زمانو ڕەگەزو ڕەنگو

---

١ العواصم من القواصم (ص: ٨٢).

٢ الطبقات لإبن سعد (٣٩/١، ٤٧)، الخلفاء الراشدون للخالدي (ص: ١١٢).

٣ مجموع الفتاوى (٢٠/١٣).

بەرژەوەندیە زەمینیەکان نوقاندبوو پەیوەندی عەقیدەو باوەڕو تەواوی پێکهاتەکانی یەك خستبوون، ئەمەی لە ئۆممەتی ئیسلامیدا بەرجەستە بوو، لە مێژووی مرۆڤایەتیدا وێنەی نەبوو.

- بینای خۆی لەسەر بنەمایەکی ئەخلاقی بەرزی وەرگیراو لە فەرمان‌و ئاراستەکانی دین هەڵچنیبوو.

- کۆمەڵگایەکی جیددی بوو، پارێزی لە شتە پەست‌و بێ بایەخەکان دەکردو خۆی بەکاروبارە گەورەو گرنگەکانەوە سەرگەرم کردبوو، جیدیەتێك نا کە سەر بۆ تاك‌و تەرایی‌و دابڕان دەکێشێت، بەڵکو جیدیەتێك کە دەبێتە داینەمۆیەك، هیممەت لە هەست‌و هەناوی خەڵکدا دەبووژێنێتەوەو بەرەو چالاکی‌و گورجوگۆڵی بزووتنەوەو کاروکۆشش هەڵیان دەنێت.

- کۆمەڵگایەکی ئامادەسازو پڕچەکی نێو تەواوی بوارەکان بوو، وێڕای گۆڕەپانی جیهادی ڕێی خودا لە هەموو گۆڕەپانەکانی تریشدا پێشمەرگەو ئامادەباش بوو، بە چەکی عەقیدەو بیرباوەڕ خۆی سازکردبوو، عەقیدەیەك کە هەمیشە هانی دەدا لە هەموو بوارەکاندا چوست‌و چالاك بێت.[1]

- کۆمەڵگایەکی خوداپەرست بوو، خوداپەرستیەك کە لە هەموو هەڵسوکەوتەکانیدا بەرجەستە ببوو، جگە لە ئەنجامدانی فەرزو سوننەتەکان، ئەنجامدانی هەموو کردارەکانی بە خواپەرستی دادەناو ڕەزامەندی خودای مەبەست بوو.[2]

ئەمانەبە شێوەیەکی گشتی سیفەتی کۆمەڵگای ئیسلامی سەردەمی (خەلیفە ڕاشیدەکان) بوون، سیفەتەکان تا لە سەردەمی پێغەمبەرێتی نزیکتر بن لە جوانی‌و ڕێکوپێکیدا تۆختترن، بە گوێرەی دوورکەوتنەوەشیان لەو زەمەنە پیرۆزە کاڵ دەبنەوە، ئەمەو لەگەڵ دەرکەوتنی ئاشوب لە سەردەمی خیلافەتی (عوسمان)داو ڕوودانی کارەساتی فیتنەی کوژرانی عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت) گۆڕان ڕوویدا.

---

١ كيف نكتب التأريخ الاسلامي (ص: ١٠٢).

٢ نفس المصدر (ص: ١٠٢).

چەند هۆکارێکی پشت دەرکەوتنی ئەم مەینەتیە گەورەیەی بەسەر ئوممەتی ئیسلامیدا هات:

**أ- هەرزانیو فەرحانیو کاریگەرییان لەسەر کۆمەڵگا:**

شتێکی بەڵگە نەویستە کە هەموو ئەو نازو نیعمەتو سەروەتو سامانانەی بەهۆی (فتوحات)ەوە دەست کەوتن کاریگەری خۆیان لەسەر کۆمەڵگەی ئیسلامی دانا، ئەمە لە کاتێکدا خۆشگوزەرانیو عەیشو نۆش سەرگەرم بوونو سەرسام بوون بە دنیا بە دوای خۆیدا دێنێتو ئامرازێکیشە بۆ کێبەرکێو رق لێبونەوە ــ بە تایبەتی لەنێو کەسانێکی عەرەبی وشکی دەشتەکیو نۆموسڵمانانی فتوحاتو نەوەی نەتەوە خۆشگوزەرانەکان ــ کە تا ئەو کات دڵو دەروونیان بە تەقوا نەشۆرابوو و، بە ئیمان رووناك نەبۆوە، عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت) هەستی بەم دیاردەیە کردبوو، لە نامەیەکیدا: کە ئاراستەی ئوممەتی کردبوو، وتبووی: کاروباری ئەم ئوممەتە ــدوای جەمبوونی سێ شت لەنێوتاندا ــ بەرەو ئاڵوگۆڕ دەڕوات: زۆربوونی نازونیعمەت، باڵقبوونی کەنیزەکزادەکانتان، خوێندنەوەی قورئان لە لایەن عەرەبو نەتەوەکانی ترەوە.[1]

پێشبینیەکەی عوسمان هاتەدی، گۆڕان لە وڵاتانی سەر سنوورەوە دەستی پێکرد. ئەمجا خۆی خزاندە نێوجەرگەی پایتەختی خیلافەتەوە، ئەمە وای لە عوسمان کرد لە وتارەکانیدا خەڵك ئاگادار بکاتەوەو لەسەر پاتاڵی دونیا خۆیان بە هیلاك نەدەن، لە وتارێکیدا ئەمە دەڵێت: خودا دنیای پێداون تا تەنها دواڕۆژی پێ داوا بکەن، بۆیەی پێ نەداون تا پاڵی پێوە بدەن، دنیا کۆتایی دێ، دواڕۆژ هەتاهەتاییە، با دوابڕاوو لەنێوچوو سەرکەشتان نەکاتو لە هەتاهەتایتیان بێ خەبەر نەکات... لە خوا بترسنو پابەندی جەماعەت بنو مەبنە تاقمو حیزب.[2] ئەمجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْۚ وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ كُنتُمۡ أَعۡدَآءٗ فَأَلَّفَ بَيۡنَ قُلُوبِكُمۡ فَأَصۡبَحۡتُم بِنِعۡمَتِهِۦٓ إِخۡوَٰنٗا وَكُنتُمۡ عَلَىٰ شَفَا حُفۡرَةٖ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنۡهَاۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ﴿١٠٣﴾ وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿١٠٤﴾﴾[3]، ئیدی لەم

---

١ تأريخ الطبري (٥/٢٤٥).

٢ أحداث وأحاديث الهرج (ص: ٥٦٧).

٣ ال عمران (١٠٣ـ١٠٤).

بارودۆخە پڕ خێرو فەڕەداو پاش فەتحکرانی وڵاتانێکی زۆرو بەرقەراربوونی ئاسایش نازو نیعمەتەکانی دونیا بەسەر موسڵماناندا ڕژان‌و خەڵك دەستی بەتاڵ بووو پیشەیان بوو بە نواندنی خەشم‌و قین لە بەرانبەر (خەلیفە)کەیاندا.[1]

لێرەوە خەتەرناکی کاریگەری هەرزانی‌و فەڕحانی‌و بێ کاری لەسەر وروژاندن‌و هەڵایساندنی ئاشوب‌و ئاژاوە هەستی پێ دەکرێت‌و، دەکرێ لە قسەکانی عوسمان بگەین کە ئاراستەی (عبدالرحمن ی کوڕی ڕەبیعە)و هاوەڵەکانی کردبوو لە (باب)،[2] عوسمان دەڵێت: خەڵك بە دەستلەپشتدانی هەندێك مشەخۆر تووشی یاخی بوون‌و لەخۆبایی بوون بوون، گوێیان پێ مەدەو نەچی لێپێچینەوەیان لەگەڵ بکەی، من دەترسم بەمە تووشی هەڵگەڕانەوە ببن.[3]

ب- سروشتی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی لەسەردەمی (عوسمان)دا (خودا لێی ڕازی بێت):

ژمارەیەك گۆڕانی پیشەداری کۆمەڵایەتی ڕوویاندا، بەوپەڕی هێز ئەمما بە سپایی ــکە زۆرێك لە خەڵك هەستیان پێ نەدەکرد ــ کاری خۆیان ئەنجام دەدا، ئەمەو لە سەرەتای نیوەی دووەمی خیلافەتی عوسماندا (خودا لێی ڕازی بێت) بەم شێوە توندە سەری هەڵداو وەختێك زانرا هەڵگەڕانەوەکە وەکو شیری سەر ئاگر هەڵچووو بە شەهیدکرانی خودی خەلیفە (خودا لێی ڕازی بێت) گەیشتە لوتکە،[4] بە درێژایی زەمەنی بزووتنەوەی (فتوحات) دەوڵەتی ئیسلامی بەرفراوانبوو، گۆڕانێکی گەورە بەسەر پێکهاتەی کۆمەڵگادا هات، ژمارەیەکی زۆر ڕەنگ‌و ڕەگەزو زمان‌و کلتورو سیستەم‌و بۆچوون‌و بیروباوەڕو هونەری ئەدەبی‌و زانستی‌و ڕەنگ‌و ڕواڵەتی لێك جیاو دژبەیەك لەم بازنە بەرینەی دەوڵەتی ئیسلامدا کۆبوونەوە، بارودۆخی کۆمەڵگا ئاڵۆز بوو، لە شارە گەورە کاریگەرەکاندا زیاتری هەستی پێ دەکرا، وەکو: (بەصرە، کوفە، شام، مەدینە، مەککە)، ئەم شارە گەورانە بە خاتری شوێنی جوغرافیان‌و زێدە گرنگبوویانەوە لە ماوەی (فتوحات)دا سوپای زۆریان بەڕێدەکردن‌و لەکاتی گەڕانەوەشیاندا پێشوازیان لێ دەکردن، بە هۆی شەهیدبوون‌و مردنی خەڵکێکی زۆریان، دانیشتوانیان کەم دەبۆوە، لە جیاتی خەڵکانی لەدەستچوویان، پێشوازیان لە خەڵکانی زۆری هەرێمە فەتحکراوەکان دەکرد، وەکو: (فارس، تورك، ڕۆم، قیبت، کورد،

١ تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة (٣٦٢/١).

٢ (باب): هەرێمێکە لە (ئازەربایجان)، معجم البلدان (٣٠٣/١).

٣ تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة (٣٦٢/١).

٤ الدولة الأموية المفترى عليها (ص: ١٦٦).

بەرپەڕ)، زۆرینەیان فارس یان عەرەبی نەسڕانی یان جوولەکە بوون.[١] زۆرینەی دانیشتوانی ئەم شارانە بریتی بوون لە هۆزە عەرەبەکانی باشووروو باکوورو خۆرهەلآت ــ کە عادەتەن هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ) نەبوون ــ، بە دەربڕینێکی وردتر خەڵکانێکی دەستپەروەردەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) نەبوون، یان لەسەردەستی هاوەڵان (ی نەوەی یەکەم) پەروەردە نەکرابوون، ئیدی لەبەر ئەوە هاوەڵان لەبەر فتوحات نەدەپەرژانە سەر پەروەردە کردنیان، یان ئەوەتە لەو کاتو شوێنانەدا هاوەڵی کەم هەبووبن، بەم جۆرە گۆڕان بەسەر کۆمەڵگاو پێکهاتە مرۆییەکەیدا هات، نەوەی پێشەنگ (سابقون)و دانیشتوانی وڵاتە فەتحکراوەکانو ئەو عەرەبە دەشتەکیانەی پێشدا هەڵگەڕابوونەوەو جوولەکەو نەسرانی، لە پێکهێنانی کۆمەڵگەیەکی خوێندەواری سادە ژیانو خستنەرووی ڕەنگو ڕوویەکی تازەی لادانو قبوڵکردنی پەشێویو بگرەو بەردەدا بەشیچوەیەکیی ڕێژەیی بەشدار بوون.[٢]

ش ــ دەرکەوتنی نەوەیەکی نوێ: بە دەرکەوتنی نەوەیەکی نوێی خەڵك گۆڕانێکی گەورەتر هاتە ئاراوە، ئەم نەوەیە لە کۆمەڵگادا جێگای خۆی کردەوە، ئەم نەوەیە لە نەوەی هاوەڵان (الصحابة) لە ڕووی سەردەمی تێداژیانو سیفەتیدا جیاواز بوو،[٣] نەوەیەك بوو وەکو نەوەی یەکەم لە دانانی بەردی بناغەی دەوڵەتو بەرپاکردنیدا بەشدا نەببوو، نەوەی یەکەم: بەهێزو ئیمانو تێگەیشتنی ڕاستو دروست لە کاکڵەی عەقیدەی ئیسلامیو ئامادەسازی تەواو بۆ گەردنکەچکردنی نەفس بۆ بەرنامەی ئیسلام ــ کە خۆی لە (قورئانو سوننەت)دا بەرجەستە دەکات ــ ناسرابوو، ئەم سیفەتانە بە ڕەنگێکی کاڵتر لە نەوەی دووەمدا دەردەکەوتن، نەوەیەك کە لە ئەنجامی فتوحاتە بەرفراوانەکاندا هاتبووە پێشەوەو بەرژەوەندی کەسیو دەمارگیری ڕەگەزیو نەتەوەیی سەری تێدا هەڵدابوو، هەندێك لە ئەندامانی نەوەی تازە پۆخڵەواتی سەردەمی نەفامیان پێوە مابوو، چونکە وەك نەوەی یەکەم -واتە هاوەڵان- لەسەر دەستی پێغەمبەری خودا (ﷺ) پەروەردە نەکرابوونو، هاوەڵانیش لەبەر ئەوە لەو ئانو ساتەدا سەرگەرمی (فتوحات)ی تازە بوونو لە لایەکی تریشەوە خەڵکە تازە موسڵمان بووەکە یەجگار زۆر بوو، ئیدی پێ ڕانەدەگەیشتن پەروەردەیەکی پێویستیان بکەن. بەڵێ هاوەڵان لە خەڵکانی دوای خۆیان بێ کێشەتر بوون،

---

١ دراسات في عهد النبوة (ص: ٣٧٩).

٢ دراسات في عهد النبوة (ص: ٣٨٠).

٣ الدولة الأموية، يوسف العش (ص: ١٣٢).

ئیدی تا سەردەمی زێڕینی (نۆبووت) دوورتر دەکەوتـەوە ئاشـوب زیـاتر دەبـوو،[١] جارچیانی ئاشوب لەنێو نەوە تازەکاندا زیاتر ئامانجی خۆیان دەپێکا.[٢]

ج- زەمینە خۆشی کۆمەڵگا بۆ وەرگرتنی پڕوپاگەندە:

بە تەماشاکردنی ئەم کۆمەڵگایە هەمەڕەنگو فرەڕەگەزو قەرەباڵغە بۆمـان دەردەکـەوێت کـە: ئێـستا سـازو ئامادەیـە بـۆ: تەقینـەوەو پێکهەڵـشاخانو وەرگرتنـی هـەموو جـۆرە پڕوپاگەندەو قسەو قسەلۆکێك.[٣]

لەبـەر ئـەوەی خـەڵك لـە مـاوەی خیلافـەتی (ئەبوبـەکرو عومـەر)دا لـە سـەردەمی (ڕیـسالەت)ەوە نـزیکتر بـوونو ئیمانیـان گـەورەتر بـووو چـاکتر بـوونو پێشەواکانیـشیان ئەرکـەکانیان باشـتر ڕادەپەڕانـدنو زیـاتر جێـی متمانـەو دڵنیـایی بـوونو خـەڵکانی خـاوەن (نەفسی مطمئنّة)-دەروونی ئارامیان زیاتر لەبـەر دەسـت دابـوون- هـیچ فیتنـەو ئاشـووبێك ڕووی نەدا.[٤] کاتێکیش لە دوادواییەکانی خیلافەتی (عوسمان)و خیلافەتی (عەلی)یدا خەڵکانی خاوەن نەفسی لەووامـە زۆربـوونو کـردەوەی چـاكو خراپیـان تێکـەڵ دەکـردنو شـەهوەتی نـەفسو شـوبهەی ئیمـانو دینیـان ڕەواج پێـدان، ئیـدی ئـەم جـۆرە کەسـانەو هـەڵگری ئـەم سیفەتانە لەنێو ڕیزی والیەکانو ڕەعیەتەکانیاندا دروست بوونو ئاشوب هەڵایسا، هەرچـەندە یەك لە دوو لایەنی ناکۆك لەسەر هەق بوو، بەڵام هەریەکەیان لە ڕاستی خۆیـەوە پاسـاوی بـۆ کردەوەکانی خۆی دێنانەوەو بە حیسابی خۆی فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە دەکـاتو، ئەم لەسەر هەقەو لایەنگری عەدالەتە، بەڵام هەرچۆنێك بێ تووشـی جۆرێـك لـە تێکـەڵکردنی هەواو نەفسو نافەرمانی دەکرد.[٥]

لـەم گفتوگۆیـەی نێـوان (عـەلی کـوڕی ئـەبوتالیب)ی ئـەمیری ئیمانـدارانو یـەك لـە شوێنکەوتووەکانیدا ئەم ڕاستیەمان زیاتر بۆ ڕوون دەبێتـەوە، کـابرا بـە (عـەلی) دەڵێـت: بـۆ خەڵك لەگەڵ (ئەبو بەکرو عومەر)دا ڕێك بوونو لەگەڵ تۆدا ناکۆکن؟ (عەلی) دەڵێـت: چـونکە (ئەبوبەکرو عومەر) کاربەڕێوەبەری خەڵکانی چەشنی مـن بـوون، بـەڵام مـن کاربەڕێوەبـەری

---

١ تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة (٣٥٦/١).

٢ ذوالنورين عثمان بن عفان.

٣ دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة (ص: ٣٨٢).

٤ مجموع الفتاوى (١٤٨/٢٨).

٥ المصدر نفسه (١٤٩/٢٨).

خەڵکانی وەکو تۆم.[١] (عوسمانی کوڕی عەففان)ی ئەمیری ئیمانداران دەیزانی لە نێوەندەکانی کۆمەڵگەدا چ دەگوزەرێت، بۆیە نامە ئاراستەی والیەکان دەکاتو دەڵێت: پاشان: بێگومان ڕەعیەت دەستی بە پروپاگەندە کردووەو قسە لە سەرشتانێك دەکەن پەیوەندیان بە ئەوانەوە نیە، بەرەو مشەخۆریو پاتاڵخۆری پەلکێشکراوە، سێ شت بەرەو ئەمەی هەڵناوە: حەزی دونیاویستی، ڕاوبۆچوونی بە پەلە، ڕقوقینی پەنگخواردوو، خەریکە برەوێتەوەو گۆڕانێکی بەسەردابێت.[٢]

خـ هاتنی (عوسمان) بە دوای (عومەر)دا (خودا لێیان ڕازی بێت):

هاتنی عوسمان بە دوای عومەرداو جیاوازی تەبیعەتی ئەم دوانە (خودا لێیان ڕازی بێت)، سەری کێشا بۆ ئەوە شێوازی ڕەفتارکردن لە بەرانبەر ڕەعیّتدا گۆڕانی بەسەردا بێت، لە کاتێکدا عومەر بە سامو توندو تیژ بوو، لێپێچینەوەی توندی لەگەڵ نەفسی خۆیو خەڵکانی ژێردەستیدا ئەنجام دەدا، بەڵام (عوسمان) تەبیعەتی نەرمونیان بوو، ڕەفتاری لە بەرانبەر خەڵکیدا نەرمو نیان بووو بەو شێوازەی عومەر لێپێچینەوەی لەگەڵ خۆیو خەڵکدا نەدەکرد، عوسمان لە بەرانبەر نەفسی خۆیدا دەیوت: ڕەحمەتی خوا لە (عومەر) بێت ئەوەی عومەر ئەنجامی دەدا کێ توانای ئەنجامدانی ئەوەی هەیە؟،[٣] هەرچەندە خەڵك لە قۆناغی یەکەمی خیلافەتەکەیدا بە هۆی نەرمو نیانیەکەیەوە لێی ڕازی بوون، ئەو (خودا لێی ڕازی بێت) خۆشڕەفتار بووو خۆشەویستیەکەی بە وێنە دەهێنرێتەوە، بەڵام (خەڵکانی سپڵەو بەدنمەك) نەرمو نیانیو تەبیعەت ناسکیو خۆش خولقیەکەی (عوسمان)یان قۆستەوەو لە دژی هەڵگەڕانەوە، خودی وتەی عوسمان دەبێتە بەڵگە بۆ بوونی جیاوازی نێوان سەردەمەکەی ئەوو سەردەمەکەی عومەر، عوسمان لە بەرانبەر کەسانێکی سەرپێچیکاردا کە زیندانی کردبوون دەڵێت: دەزانن چ شتێك وای لێکردن خۆتان لەبەرانبەر مندا ئازا پیشان بدەن؟ تەنهاو تەنها نەرمونیانیەکەم بوو.[٤] کاتێك نیازی سەرپێچیکارانو ئاژاوەچیان ئاشکرابوو، عوسمان بە مەبەستی وەڵامی داواکانیانو بەرپەرچدانەوەی ڕەخنەکانیان فەرمانی پێکردن لە بەرانبەر هاوەڵانو ئاپۆڕای خەڵکدا ئامادە بن، موسڵمانان وتیان دەبێت شەڕیان لەگەڵ بکرێتو لەنێوببرێن، عوسمان دەربارەی نەرمونیانیەکەی جولایەوەو وتی: کە دەبێت لێیان

١ مقدمة إبن خلدون (ص: ١٨٩).
٢ التمهيد والبيان (ص: ٦٤).
٣ تأريخ الطبري (٥/٤١٨).
٤ تأريخ الطبري (٥/٢٥٠).

بگەڕێینو بەم شێوەیە وتی: بەڵکو لێیان دەبورینو لێیان قبوڵ دەکەینو ئارام دەگرین، ئێمە نابێت (حەد) لە کەسێك دەربکەین تا (تاوان) ئەنجام نەدات، یان کوفرێکی لێ دەرنەکەوێت شایانی حەدلێ دەرکردن بێت.[1]

حـ- دەرچوونی هاوەڵە گەورەکان لە مەدینە:

عومەر (خودا لێی ڕازی بێت) گەمارۆی چوونە دەرەوەی لەسەر ناودارانی قورەیشو کۆچەران دانابوو، نەیدەهێشت بەبێ مۆڵەتی ئەوو ماوەیەکی سنووردارکراو لە شارەکان بچنە دەرەوە، ئەمانیش سکاڵای خۆیان لێرەولەوێ دەخستەڕوو، عومەر ئەمەی زانیەوە، هەستایە سەرپێو وتی: بە ئاگا بن، من تەمەنی ئیسلامم وەکو تەمەنی (وشتر) داناوە، لە پێنج ساڵیەوە دەست پێ دەکات، ئەمجا دەبێتە (٦)ساڵ، (٧) ساڵ، (٨) ساڵ، کە بوو بە (٩) ساڵ کەڵپەکانی دەکەونو پێی دەوترێت (بازل)، ئایا وشتری کەڵپە کەوتوو جگە لە دابەزین چ شتێکی تری لێ چاوەڕێ دەکرێت؟، جا بزانن، ئیسلامیش چووەتە ئەو قۆناغەوە، قورەیشیەکان دەیانەوێت ماڵو سامانی خودا بۆ گوزەرانی خۆیان بەکاربێنن، نەك بۆ عیبادەت، ئێستا کوڕەکەی (خەتتاب) ماوەو زیندووە، من لە دۆڵو شیوەکانی (حرة) ڕاوەستاوم، دەستێکم خستووەتە گەردنیانو بە دەستەکەی تریشم بە توندی پشتە ملم گرتوونو ناهێڵم خۆ هەڵدەنە نێو ئاگرەوە،[2] عومەر (خودا لێی ڕازی بێت) دەترسا ئەم هاوەڵە گەورانە لە وڵاتە فەتحکراوەکاندا بڵاوببنەوەو زەویو زارو سەروەتو سامانیان بکەوێتە دەستو حیسابیان بڕوات، جار هەبوو یەکێك لە کۆچەران (ی نێو مەدینە) دەهاتو داوای مۆڵەتی دەرچوونی لە عومەر دەکرد، بەم شێوازە جوابی دەکرد: غەزاکانت لەگەڵ پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەنجام داون پلەیان بەرز کردوویتەوە، زۆر زۆریش لە غەزاکانی ئیمڕۆ باشترن، نابینی تۆ دنیا دەبینی بەڵام ئەو تۆ نابینێت،[3] بەڵام عوسمان بۆی شل کردنو ڕێگای چوونە دەرەوەی پێدان.

س- دەمارگیری نەفامی:

(إبن خلدون) دەڵێت: کاتێك (فتوحات) گەیشتە لوتکەو حوکومەتی ئوممەت(ی ئیسلامی) تۆکمە بوو، ئەو عەرەبانەی هاوسنووری نەتەوەکانی تری وەکو (بەصرەو کوفەو شامو

---

١ تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة (١/٣٦٤).

٢ تأريخ الطبري (٥/٤١٣).

٣ تأريخ الطبري (٥/٤١٤).

مصر) دابارینە نێو شارەکان، بە ڕەچاوکردنی ئەم ڕاستیە حاشاهەڵنەگرە کە (کۆچەران و پشتیوانان و قورەیش و دانیشتوانی حیجازو خەڵکانێکی غەیری ئەمانیش ئیمتیازی هاوەڵایەتی پێغەمبەر (ﷺ)یان پێ درابوو و شوێنکەوتەی ڕاستو دروستی سوننەت و ئادابەکانی ئەو زاتە بوون، تەواوی عەرەب لە هۆزەکانی (بەنی بەکرو بەنی وائیل و عبدالقیس و ڕەبیعە و کیندە و ئەزدو تەمیم قوزاعە و غەیری ئەمانیش -تاکوتەرایان نەبێت- بەم پلەی (هاوەڵایەتیە)ی پێغەمبەر (ﷺ) نەگەیشتبوون، بە حوکمی ئەوە لە (فتوحات)دا ڕۆڵیان گێڕابوو خۆیان بە شایستە دەزانی، ئەمە لەگەڵ ئەوەدا ئاقڵ و خانەدانەکانیان دانیان بە پایەبەرزی و شکۆداری خەڵکانی پێشڕەو (ئەهلی سابیقە)ی ئەم دینەدا دێناو مافو ئیمتیازاتی ئەوانیان لە (ژیانی نێو وەحی و ڕیسالەت و دابەزینی فریشتە)دا دەناسی، جا کاتێك لێشاوی هەموو ئەو خەڵکە دەرکەوتو بارودۆخەکە بە جۆرێکی لێهات هەندێك شتی لەبیر خەڵك بردەوەو دوژمن دەستەپاچە بووو دەسەڵات تێرو تەواو بوو، دەمارەکانی سەردەمی جاهیلی خوێنیان تێدا زایەوەو سەرکردایەتی (کۆچەران و پشتیوانان و قورەیش و غەیری ئەوانیان) بەسەر خۆدا بەلاوە گران بوو، ئیدی لوتی خۆیان باداو یاخی بوون، ئەمە لە ڕۆژگاری عوسماندا سەری هەڵدا، تانەوتەشەرو ڕەخنەیان لە والیەکانی دەگرت و لەحزە بە لەحزەو هەنگاو بە هەنگاو گازندەیان ئاراستە دەکردن و خۆیان لە ڕاست جێبەجێکردنی فەرمانەکانیان دەگنخاندو تۆمەتی خۆسەپێنی و خۆجیاکردنەوەیان دەخستنە پاڵ و وێڕای هەموو ئەمانەش بە کەیفی خۆیان لێزمەی توانجیان لە عوسمانی خەلیفە دەگرت.

ئیدی ئەم قسەو قسەلۆك و پڕوپاگەندانە لەنێو هەواداراانیاندا تەشەنەیان سەند، هەر کەسە لە ڕاست خۆیەوە بە ناڕەوا دەستو زمانی دەکوتا، دڵو دەروونیان تێکچووو گەلەکۆمەیان لە دژی عوسمان کردو داوایان لێدەکرد لە پۆستی خیلافەت دابەزێت و والیەکانیشی لێبخات، هەواڵی ئەمە گەیشتە مەدینەو هاوەڵان پێیان زانی، عوسمان قاصیدی بە وڵاتاندا بڵاوکردنەوە، گەڕانەوەو وتیان: شتێکی خراپمان نەهاتە بەر چاوو موسڵمانانیش چ کەسە دیارو بەرچاوەکان چ خەڵکانی عەوامیان ڕەخنەو گازندەیان لە عوسمان نەبووە.[1]

**ش- ڕاوەستانی بزووتنەوەی (فتوحات) بە هۆکاری ئاستەنگی سروشتی و مرۆیی:**

بزوتنەوەی فتوحاتی ئیسلامی لەدوادواییەکانی خیلافەتی عوسماندا بە هۆی ژمارەیەك کۆسپی سروشتی و مرۆیی لە هەموو لایەکانی (ئێران و باکووری شام و ئەفریقیا) ڕاوەستا،

---

[1] تأريخ إبن خلدون (٢/٤٧٧).

دەرەنجام دەستکەوتەکانی جەنگیش کۆتاییان پێهات، عەرەبە دەشتەکیەکان لەنێو خۆیاندا دەیانوت: دەستکەوتەکانی کۆن چیان بەسەرهات؟ زەوی‌و زاری وڵاتە فەتحکراوەکانیان بە مافی خۆیان دەزانی‌و دەیانوت زەویەکانمان چیان لێهات؟[١]، لەمەولا پڕوپاگەندەی پوچ بڵاوکرانەوەو (عوسمان)یان تۆمەتبار دەکردو دەیانوت: کە بە کەیفی خۆی زەمینە وەقفکراوەکانی سەر موسڵمانان دەستکاری دەکات‌و بەسەر ئەو کەسانەیاندا دابەش دەکات کە خۆشی دەوێن، ئەم بوختانە کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر دڵ‌و دەروونی ئەو عەرەبە دەشتەکیانە دانا کە زۆربەیان بەبێ ئیش‌و کار مابوونەوەو نیوەی کاتیان بە خواردن‌و خەو بەڕێ دەکردو نیوەکەی تریشیان لە دەموەردان لە سیاسەتی دەوڵەت‌و تۆمەتە پاڵدراوەکانی لای (عوسمان) -کە لە لایەن (سەبەئی)یەکانەوە هەڵدەبەستران- بەسەر دەبرد، یەکێك لە کاربەدەستەکانی (عوسمان) کە (عبدالله ی کوڕی عامر) بوو، زوو دەرکی بەم خەتەرە کرد، کاتێك عوسمان سەبارەت بەمە ڕاوێژی بە والی‌و کاربەدەستەکانی کردو داوای لێکردن مێشکی خۆیان ماندوو بکەن‌و ڕای بەهێزو چارەسازی پێشان بدەن، (عبدالله) پێی وت کە چاك وایە فەرمان بە خەڵك بکات جیهاد بکەن‌و، بە شێوەیەك لە کورەی جیهاددا سەرگەرمیان بکات کە کەسێکیان دەرفەتی نەبێت کێچی سەری خۆی بفرێنێت‌و دەست بۆ کلکی وڵاخەکەی بەرێت.[٢]

سازدانی کەش‌و هەوایەکی ئاوا ناسازی پڕ قسەو قسەلۆك‌و بۆچوونی وا ناڕەوا بۆ خەڵکانێك کە بە غەزاوە ڕاهاتوون‌و تۆزقاڵێك لە دین حاڵی نەبوون مەترسیدارەو دەگونجێت هەموو جۆرە کارێکی خراپیان پێ ئەنجام بدرێت‌و لە لایەن خەڵکی بێ دینەوە ئاراستە بکرێن‌و بکرێنە دەستە چیلەی ئاگری ئاشوب‌و شۆڕش‌و فیتنە، ئەمەی وتمان خرایە بواری کردارەوەو ئەنجام درا، عەرەبە دەشتەکیەکان بە هۆی وەستانی بزووتنەوەی فتوحات‌و- بەدەست لە پشتدانی سەبەئیە جووەکان- بەشداریەکی بەرچاوی هەڵایسانی فیتنەکەیان کرد، کەواتە وەستانی بزووتنەوەی فتوحات یەکێك بوو لە هۆکارەکانی هەڵایسانی فیتنەکە.[٣]

---

١ تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة (١/٣٤٤).

٢ تأريخ الطبري (٢/٣٤٠).

٣ تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة (١/٣٥٣).

ص- تێگەیشتنی هەڵە لە چەمکی (وەرع)و لێکدانەوەی بە حەرامکردنی حەڵاڵ:

(وەرع) لە شەرعدا شتێکی چاکەو بریتیە لە خۆبواردن لە شتێك گوناهەی تێدا نیە، لە ترسی ئەوە نەبادا گوناهێکی تێدا بێت، لە بنەڕەتدا بریتیە لە خۆپارێزی لە شتە (موباح)و ڕێگەپێدراوەکان لەبەر خاتری خودا، (وەرع) شتێکی شەخسیەو دروستە کەسێك خۆی پێوە پابەند بکات، بەڵام بۆی دروست نیە داوا لە خەڵکانی تر بکات وەکو ئەو پێیەوە پەیوەست بن، (وەرع)ی مرۆڤی نەفام ترسناکترین جۆری (وەرع)ە، کە (موباح) حەرام دەکات، خەڵکانی ئاشوبگێڕی سەردەمی عوسمان بەم دەردەوە گیرۆدە ببوو،[١] ئەمەو دوژمنانی ئیسلام ئەم هەستو نەستەی ئەوانی بەکارهێناو هێندەی تری فو پێدا کردو تا کار بەوە گەیشت، پێیان وابوو ئەوەی عوسمان لە (موباحات) یان (مەصالیح) ئەنجامی دەدات دەرچوونە لە بازنەی ئیسلامو گۆڕینی ڕیوشوێنی پێشینانی خۆیەتی، ئەم مەسەلانە لەبەرچاوی نەفاماندا گەورە کرانو بەم هۆیەوە خوێنی خەلیفەی ڕاشید عوسمانی کوڕی عەففان (خودا لێی ڕازی بێت)یان حەڵاڵ کردو پشتیوانی هەموو ئەو کەسانەشیان کرد کە بە حەڵاڵیان داناو، ئیدی لەو ڕۆژەوە تا ئەمڕۆ دەرگای فیتنەو ئاشووبیان لەسەر موسڵمانان ئاوەلا کرد.[٢]

ط ـ دەرکەوتنی نەوەیەکی نوێی چاوچنۆك:

خەڵکانێك لە نەوەی دووەمو ڕۆڵەی هاوەڵان پەیدا بوون، خۆیان بە شایستەی حوکومەتو ئیدارەکردنی دەزانی، ئەمانە پێیان وابوو ڕێگای بەردەم ئەم ئاواتەیان داخراوە، عادەتەن ئەوانەی چاو دەبڕنە شتێك و دەرفەتێك بۆ گەیشتن بە مەرامەکەیان شك نابەن، لە پێناوی گۆڕانکاریدا هەموو کارێکی توند دەگرنە بەر، چارەسەری دەردی ئەم جۆرە کەسانە زۆر ئاستەمە.[٣]

ع- تاقمێکی تاکبۆوەی دابڕاوی داخلە دڵ:

خەڵکێکی مونافیقی دابڕاو و تاکبۆوە هاتنە نێو ئیسلامەوەو وێڕای داخلەدڵیەکەیان زیرەكو فێڵبازیش بوون، بەڵام نەیاندەتوانی ڕاستەوخۆ خاڵە لاوازەکان بگرنو لە ڕێیانەوە فیتنەو ئاشووب بەرپا بکەن، ئیدی خەڵکانێکی وایان بۆ هێنانەدی ئەم مەرامەیانو پێکانی

---

١ الاساس في السنة (١٦٧٦/٤).

٢ أحداث وأحاديث فتنة الهرج (ص: ٥١٧).

٣ الاساس في السنة (١٦٧٦/٤).

ئامانجە شوومەکانیان پەیدا کرد کە سادەو ساکارو گوڕایەڵ بن، ئەوەی ڕوویداو هاتەدی پەرێزو بەرهەمی پیلانی ئەم مونافیقانە بوو.[١] پێشدا زانیمان کە جوولەکەو نەصرانی‌و فارس چۆن هەریەکەیان بە بارێك داخ‌و ڕقەوە لە بەرانبەر ئیسلام‌و دەوڵەتی ئیسلامیدا خۆیان خزاندە نێو کۆمەڵگای ئیسلامیەوەو نیشتەجێ بوون، بەڵام وێڕای ئەمانە خەڵکانێکی تر هەبوون‌و بە هۆی ئەو گوناهو تاوانانەی لە نێوەندی دەوڵەتدا ئەنجامیاندابوون، لە لایەن خەلیفە یان والییەکانەوەو لە هەندێك شاردا حەدیان لێ دەرکرابووو سزادرابوون، بە تایبەتی لە شارەکانی (بەصرەو کوفەو مصرو مەدینە)، ئیتر ئەم مونافیقە داخ لە دڵانەو جوولەکەو نەصرانی‌و فارس‌و تاوانکارانە چەند تاقمە خەڵکێکیان کردە دەستەچیلەی هایساندنی ئاگری ئاشوبەکە، کە زۆربەیان عەرەبی دەشتەکی بوون‌و وەکو پێویست لە (دین) حاڵی نەببوون، لە هەموو ئەمانە تایەفەو تاقمە خەڵکێك دروست بوون‌و بە لای هەموو خەڵکی ئەو کاتەوە بە (خەڵکانی شەڕانی) ناسرابوون‌و بەم شێوازانە وەصف دەکران: شەللاتیانی نێو شار، گێرەشێوێن‌و ئاژاوەچیانی نێو هۆز، خەڵکانی سەر ڕێ‌و کانی ئاوان، کۆیلەکانی مەدینە.[٢] گەلە گورگی عەرەب،[٣] بودەڵەو گرگنی نێو خەڵك‌و گەلەکۆمەکەران،[٤] خەڵکانی گێل‌و نەفام،[٥] خوێڕی‌و بیژووکانی نێو هۆز،[٦] خەڵکانی کەللە وشك، عەنتەر و مەگەز، شوانە وێڵەو ئاژاوەچیانی هۆز، خەڵکانی پەست‌و بێ ڕێز،[٧] ئامرازو دەسکەلای دەستی شەیتان،[٨] لە سەرچاوەکان ناوی (عبدالله ی کوڕی سەبەئی صەنعانی جو)ش لە ڕیزی ئەم خەڵکە داخلەدڵ‌و بیژۆکەدا هاتووە، ئەو جوولەکە بوو، پاشان دەبێتە موسڵمان، کەسێك پەردەی سەر نیازەکانی هەڵنەدایەوە، بەو پێودانەی یەکێکە لە موسڵمانان بە ئارەزووی خۆی تەراتێنی بە نێو وڵاتە ئیسلامیەکاندا دەکرد،[٩] بە ئیزنی خودا لەمەولا قسەی لەسەر دەکەین.

---

١ المصدر نفسه (١٦٧٦/٤).

٢ دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة(ص: ٣٩٢).

٣ المصدر السابق (ص: ٣٩٢).

٤ الطبقات لإبن سعد (٧١/٣)، ئەم وەصفە هی (إبن سعد)ە.

٥ دراسات في عهد النبوة (ص: ٣٩٢).

٦ شذرات الذهب (٤٠/١)، ئەمە وەصفی (إبن العماد)ە.

٧ شرح صحيح مسلم (١٤٩/١٥،١٤٨).

٨ تأريخ الطبري (٣٢٧/٥).

٩ دراسات في عهد النبوة (ص: ٣٩٤).

**لـ تەگبیرێكی تۆكمەو دامەزراو بۆ وروژاندنی خەڵك لە دژی عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت):**

كۆمەڵگا لە دەرەنجامی چەند هۆكارێكی كاریگەری تێكهەڵكێشدا بە تەواوەتی باوەشی بۆ وەرگرتنی قسەو قسەڵۆك كردبوەو زەمینەی سەرهەڵدانی بوختان‌و پڕوپاگەندە خۆش ببوو، دیواری بینای كۆمەڵگا ئامادە بوو كەلێنی تێ بكەوێ.

ئاشوبگێڕان بە پاساوی فەرمانكردن بە چاكەو ڕێگرتن لە خراپە یەكدەنگ بوون لەسەر توانجگرتن لە والیەكان، ئیدی ڕەشەخەڵكیان لەگەڵ كەوت، (عوسمان)یش (خودا لێی ڕازی بێت) بە حوكمی ئەوە سەرۆكی دەوڵەتە بەر لێزمەی بوختان‌و توانج‌و پلاركەوت، بە كورتی‌و گوشراوی ئەو توانج‌و پلارانەی ئاڕاستەی خەلیفە دەكران‌و ئەو بوختانانەی لە دژی ئەو ڕەواجیان پێ دەدرا لەم چەند خاڵەدا زەق دەبنەوە:

- چەند هەڵوێستێكی شەخسی ئەو پێش وەرگرتنی پۆستی خیلافەت وەك: دیارنەبوونی لە هەندێك جەنگ‌و غەزادا.
- سیاسەتی لە بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا: وەك پێدانی پۆستەكانی حوكومەتەكەی بە خزمە نزیكەكانی‌و، شێوازی بەڕێوەبەرایەتیكردنەكەی.
- چەند ئیجتیهادێكی تایبەت بە خۆی یان تایبەت بە بەرژەوەندی ئوممەت وەك: ئەنجامدانی نوێژی تەواو لە (مینا)دا، كۆكردنەوەی (قورئان)، بەرفراوانكردنی ڕووبەری مزگەوتی نەبەوی).
- هەڵسوكەوتی ئەو لە بەرانبەر هەندێك هاوەڵدا، وەك: (عەممار، ئەبو زەڕ، ئیبن مەسعود).

لە كتێبی (تیسیر الكریم المنان في سیرة أمیر المؤمنین عثمان بن عفان، شخصیته وعصره)دا هەر هەموو هەڵوێست‌و وەڵامەكانی (عوسمان)م لە بەرانبەر ڕەخنەی ناحەزو ئاژاوەگێڕەكاندا ڕوون كردوونەتەوە.

بێگومان تانەوتەشەردان لە عوسمان‌و بوختان بۆ هەڵبەستنی چ لەسەردەمی خۆیداو چ لە سەردەمانی دوای خۆیدا زێدەڕۆییەكی زۆری تێدا كراوە، ئەو لە سەردەمی خۆیدا وەڵامی هەموو ئەو ڕەخنانەی دانەوە كە ئاراستەی كران‌و پوچەڵی كردنەوە، ئەو بوختانانەی دوای سەردەمی خۆیشی لە لایەن ڕاوی‌و مێژوونووسە (درۆزنە)كانەوە بۆی هەڵبەستراون هیچیان

پلەی (صحیح)یان وەرنەگرتووەو ڕاستیەکەی هیچ کامێك لەو ڕەخنانە چ بە تاك چ بە کۆ ناگەنە ئاستێك ببنە مایەی بەدەستەوەدانی پاساو بۆ کوشتنی.[١]

ئەم ڕەخنانەی باسکران‌و لە کتێبەکانی مێژووی وەکو (طبري)و غەیری ئەویشدا نووسراونەتەوەو لە ڕێگای نەفام‌و چیرۆکهەڵبەستە لاوازەکان بە تایبەتی شیعەکانەوە گێڕدراونەتەوە بەردەوام بەڵایەکی گەورەو شومن لەسەر ڕاستیەکانی مێژوونامەی خەلیفەو ئیمامەکان، بە تایبەت لە قۆناغی ئاژاوەو ئاشووبەکاندا، زۆر بە داخەوە مێژوونامەی (عوسمان)ی ئەمیری ئیمانداران (خودا لێی ڕازی بێت) بەشێکی زۆری ئەو ڕیوایەتە هەڵبەستراوانەی تێخزێنراوەو بە ئامانجی لەکەدارکردنی هاتوون تەموومژیان خستۆتە سەر ژیاننامە خاوێنو پڕشنگدارەکەی.

عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت) زوو دەرکی بەمە کردو نامەی بۆ والیەکانی نووسی‌و وتی: پاش حەمدو سەنای خودا: ڕەعیەت دەستی کردووە بە هاویشتنی توانج‌و پلارو خەریکە ئاگری شەڕ هەڵدەکات، (٣) شت بۆ ئەمە هانی دەدات: دنیاویستی، هەواو هەوەس ، ڕقوقینی پەنگخواردو لەدڵدا .[٢]

(إبن العربي) سەبارەت بەو ڕەخنەو تانەو تەشەرانە دەڵێت: بەپێی ڕیوایەتی ڕاویە درۆزنەکان وتوویانەو تانەو تەشەریان هاویشتووەو ژەهری خۆیان هەڵڕشتووە وتوویانە: عوسمان لە ماوەی سەردەمی خۆیدا جەورو ستەم‌و خراپەی زۆری پەرەپێداوە،.... ئەم ڕیوایەتانە هەر هەموویان بە (سەنەدو مەتن)یانەوە پوچ‌و بێ بنەمان.[٣]

**ف- بەکارهێنانی چەند شێوازو ئامرازێك بۆ تووڕەکردن‌و وروژاندنی خەڵك:**

گرنگترین ئەو شێوازانە: پەرەپێدانی: (پڕوپاگەندە، دەمبەدەمەو مشتومڕ) لەسەر خەلیفە لەنێو خەڵکیدا، (توانجگرتن) لە والیەکان‌و (ساختەکردنی نامە)و، هەڵبەستنی لەسەر زمانی هاوەڵان (خودا لێیان ڕازی بێت) وەکو: (عائیشە، عەلی، تەڵحە، زوبەیر)، پڕوپاگەندەکردن بۆ ئەمە کە (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) (خودا لێی ڕازی بێت) بۆ خیلافەت شایستەترە، ئەو سەروەسێت‌و جێگەداری پێغەمبەری خودایە دوای وەفاتی، ڕێکخستنی فیرقەیەك لە (بەصرەو کوفەو میصر)، ئەمەو دروستکردنی چوار فیرقە لە هەر شارێك لەم شارانەدا

---

١ دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة (ص: ٤٠٠).

٢ التمهيد والبيان (ص: ٦٤).

٣ العواصم من القواصم (ص: ٦١، ٦٣).

بەڵگەیە لەسەر تەگبیرو پیلانێکی نەخشە بۆ کێشراوی پێشوەخت، – کەدوایە هەموویان بەسەر (مەدینە) وەربوون–، وایان لە دانیشتوانی مەدینە حاڵی کرد کە: ئەوان تەنها بە دەم بانگەوازی هاوەڵانەوە هاتوون، ئیدی بارودۆخەکەیان شێواند، تا کار گەیشتە سەر کوشتن.[1]

وێڕای ئەم شێوازو هۆکارانە چەند دروشمێکی تریشیان بەرز کردبوونەوە، وەکو: (هوتافکێشانی تەکبیر (ألله أكبر)، ئەم جیهادەیان لە دژی ستەمکارانە، ئەوان هاتوون فەرمان بە چاکە بکەنو بەر بە خراپە بگرن، هاتوون داوای گۆڕینو لێخستنی والیەکان دەکەن)، ئەمجا داواکانیان سەریان کێشا بۆ (لێخستنی خودی خەلیفە)، ئیدی بەڕوو هەڵماڵاویو بێ شەرمانە ئەم داوایەیان خستەڕوو، هەر بەمە ڕانەوەستان ، بەڵکو هەڵیانکوتایە سەر ماڵی خەلیفەو نیازی خۆیان بۆ کوشتنی ئاشکرا کرد ، بە تایبەتی کاتێك هەواڵیان پێگەیشت کە دانیشتوانی شارو وڵاتان خەریکە بۆ پشتیوانیکردنی (خەلیفە) بەڕێ دەکەون، ئەوان هێندەی تر گڕو کڵپەی دەروونیان بەرز بۆوەو سەری کێشا بۆ توندکردنی ئاڵقەی ئابلۆقەی سەر خەلیفەو پاشانیش کوشتنی بە هەر شێوازو ئامرازێك بێت.[2]

ك- ڕۆڵی (عبدالله ی کوڕی سەبەء) لە فوکردن بە ئاگری ئاشوبەکەدا:

لەم چەند ساڵانەی کۆتایی خیلافەتی عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت)داو لە وڵاتە سەر سنووریەکانی ئیسلامداو لە ئەنجامی هەندێك لە هۆکارەکانی گۆڕان (کە پێشدا باسمان کردن) نیشانەکانی پشێویو ئاڵۆزی لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا دەرکەوتن، چەند جوولەکەیەك کە بە ڕواڵەت موسڵمان ببوونو سیاسەتی پارێز (تەقیە)یان پەیڕەو دەکرد، چاوەڕوانی ڕۆژێك بوون هۆکارەکانی ئاشوب بقۆزنەوەو لەم پەنایەدا دەرفەتی لێدانی خۆیان لە ئیسلام وەربگرن، (عبدالله ی کوڕی سەبەء)ی ناسراو بە (داکرەش) یەکێك بوو لەو جوولەکانە، هەرچەندە بە بێڕەزا نیشاندانو زەقکردنەوەی ڕۆڵی (کوڕی سەبەء) بەو ڕادەیەی خەڵکانێك کردوویانە دروست نیە،[3] بەڵام دروستیش نیە گومانی تێ بخرێتو ڕۆڵی خراپی ئەو وەك یەکێك لە هۆکارە هەرە کاریگەرە دیارو بەرچاوو سامناکەکانی سەر ڕووداوەکانی ئاشوبەکە بە کەم سەیر بکرێت، دەبێ ئەوە بزانین کەشوهەوای ئاشوبەکە ڕێی بۆ خۆشکردو چەند هۆکارێکی تر یارمەتیان دا بە خۆیو خستنەڕووی بیروڕاو بۆچوونە شەخسیەکانی کە لە

---

١ دراسات في عهد النبوة (ص: ٤٠١).

٢ المصدر نفسه (ص: ٤٠٢).

٣ وەکو (سەعیدی ئەفغانی) لە کتێبی (عائشة والسياسة)دا ئەمەی کردووە.

ناخــە پــڕ لــە ڕقوقینــە جولەکایەتیەکەیــەوە جۆگەلــەیان بەســتبوو بێتــە نێوجەرگــەی ڕووداوەکانەوە، ئەمەو بە ئامانجی دەستوەشاندن لە کۆمەڵگای ئیسلامی‌و پەرتەوازەکردنی‌و چاندنی تۆوی دووبەرەکی لە نێو تاکەکانیـداو خۆشـترکردنی ئـاگری ئاشوبەکە ڕەواجـی بـە بیروبۆچوونەکانی دەدات، ئیتر ئەو (جووە) بووە یەکێك لـە هۆکارەکـانی کـوژرانی عوسمـانی ئەمیری ئیمانداران‌و دابەشبوونی ئوممەت بەسەر چەند تاقمەو گروهێکدا،[١] بە کـورتی: (ئـیبن سەبەء) بە چەند شتێکی ڕاست بناغەی بیروڕاکـانی دامەزرانـد، ئـەمجا بـە چـەند بیروڕایـەکی خراپ‌و گەندەڵ بینای بۆچوونەکانی قیتکردەوە، بە شێوەیەك لەبەر چاوی خەڵکانی سـاکارو خۆشبەقاو زێدەڕەو ڕازاوەبێ، بە خاتری ئەمە چـەند ڕێیـەکی بـە قوڵـت‌و پێـچی گرتـە بـەرو سەری لە خەڵك شێواندو کار بـەوە گەیـشت لـە دەورەی کۆبوونـەوە، لـە دەرگـای (قورئـانی پیرۆز)ی داو بە فکرە گەندەڵەکـەی دەسـتی بـە تـەئویلکردنی ئایەتـەکانی کـرد، بـە جۆرێك دەیوت: سەرم دەسوڕمێت لە کەسێك پێی وابێت (عیسا) دەگەڕێتەوەو باوەڕ بە گەڕانـەوەی (محمـد) ناکـات، ئەمــە لــە کاتێکـدا خــودای بــەرز دەفــەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِى فَرَضَ عَلَيۡكَ ٱلۡقُرۡءَانَ لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ﴾[٢] واتــە: ئــەو خودایــەی گەیانـدنی قورئـانی لەسـەر فـەرزکردووی دەتگێڕێتەوە بۆ (مَعَاد)،[٣] کەواتە: (محمد) لە (عیسی) بۆ گەڕانەوە شـایانترە،[٤] هـەروەها بـۆ ئیسپاتکردنی وەسـێتەکەی مـەڕ عـەلی (خـودا لێـی ڕازی بێـت) ڕێبـازی (قیـساسی فاسـید)ی گرتبووە بەرو دەیوت: (هەزار پێغەمبەر هەبوون، هەر پێغەمبەرێك سەروەسـێتێکی هـەبووە، (عـەلی) سەروەسـێتی (محمـد)ە، ئـەمجا دەیـوت: (محمـد) کۆتـا پێغەمبـەرە، عـەلیش کۆتـا سەروەسێتە)، کاتێکیش بۆچوونەکانی لە هەناوی شوێنکەوتووەکانیدا ڕەگیان داکوتان، ڕێـك بەرەو ئامانجی دیاریکراوی هەنگاوی نا، کە خۆی لە هەڵگەڕانەوەی خەڵك لە دژی (عوسمـانی کوڕی عەففان)ی خەلیفەدا نیشان دەدات، هەندێك قسەی دەکردن ڕێك لەگەڵ قسەی نەفـسی

---

١ تحقيق مواقف الصحابة (٣٢٧/١).

٢ القصص (٨٥).

٣ واتای ئایەتەکە بە گوێرەی تەفسیرەکەی (ابن کثیر) ئەمەیە: ئەو زاتەی پەخشکردنی قورئانی بە نێو خەڵکدا لەسەر واجب کـردووی بـۆ (مـەعاد) واتـە قیامـەتت دەگێڕێتـەوەو سـەبارەت بـە ئەمـە لێـت دەپرسێتەوە، وەك دەفەرموێت ﴿فَلَنَسۡـَٔلَنَّ ٱلَّذِينَ أُرۡسِلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَنَسۡـَٔلَنَّ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ۝٦﴾ (الاعراف: ٦). واتە: بـە تەئکیـد هـەم لە ئەو خەڵکانە دەپرسینەوە کە پێغەمبەرانمان بۆ لا ناردبوون، هەم لە خودی (پێغەمبەران)یش دەپرسینەوە، وەرگێڕ. تفسير القران الكريم (٢٥٩/٦).

٤ تأريخ الطبري (٤٢٧/٥).

هەندێك خەڵکی دەرووننەخۆش دەهاتنەوە، بە جۆرێك پێی دەوتن: کێ لەو کەسە ستەمکارترە وەسێتی پێغەمبەری خودا (ﷺ) پشتگوێ دەخاتو بەسەر عەلی سەروەسێتدا باز دەداتو خۆی بەسەر کاروباری ئۆممەتدا دەسەپێنێت، ئەمجا پاش ئەمە پێی گوتن: عوسمان بە ناهەق دەستی بەسەر خیلافەتدا گرتووەو، ئەوە (واتە عەلی) سەروەسێتی پێغەمبەری خودا (ﷺ)ە، لە پێناوی ئەمەدا ڕاپەڕنو بیوروژێننو تانەو تەشەر لە والیەکانتان بگرنو لە بەرگی (فەرمان کردن بە چاکەو بەرگرتن لە خراپە)دا خۆ دەرخەنو بەم شێوەیە خەڵك بۆ مەسەلەی وەسێتەکەی لە مەڕ عەلی بانگهێشت بکەن بە پۆل لە دەورەتان دەئاڵێن.[1] ئیدی جارچیانی بانگەشەکەی بە جیهانی ئیسلامدا بڵاوکردنەوەو لەگەڵ خەڵکانی گەندەڵو دڵنەخۆشی شارو وڵاتان دەستی بە نامە گۆڕینەوە کردو بە نهێنی بانگەشەیان بۆ بیروبۆچوونەکانیان دەکردو بەخاتری ڕاکێشانی خەڵك بە لای خۆیاندا خۆیان لە بەرگی فەرمانکردن بە چاکەو بەرگرتن لە خراپەدا دەردەخستو نامەیان بۆ شارو ویلایەتەکان دەناردنو تێیاندا والیەکانیان بە لەنگیو نەنگی نیشان دەدا، خەڵکانی هەواداری ئەوانیش لەو شارانە لاسایی ئەوانیان دەکردەوەو وەکو ئەوان نامەیان بۆ دەنووسینەوە، کار بەوە گەیشت نامەو نامەکاری لەم جۆرە بابەتە هەموو شارەکانی گرتەوەو دەرەنجام زەویان پڕ کرد لە پروپاگەندە، ئەوەی دەریاندەخست نەیاندەویست، ئەوەی مەبەستیان بوو دیزە بە دەرخۆنەیان لێ دەکرد، خەڵکی هەر شارێك دەیانوت: ئێمە ساغو سەلامەتینو وەکو خەڵکی ئەو شارانە گیرۆدە نەبووین، تەنها مەدینە نەبێت، لە هەموو شارەکانەوە بەسەریان دادا، ئەوانیش وتیان: ساغو سەلامەتینو تووشی ئەم دەردە نەبووین کە خەڵك گیری پێوە خواردووە.[2]

لەم دەقەدا ئەو شێوازەمان بۆ دەردەکەوێت کە (کوڕی سەبەء) پەیڕەوی کردووە، بە جۆرێك ویستوویەتی بیخاتە بەر چاوی خەڵکی کە دوو (هاوەڵ) لە گێرەو کێشەدان، یەکێکیان (عەلی)یەو مافی زەوت کراوە، ئەوەی تریشیان (عوسمان)ەو داگیرکەرە، پاش قەناعەتپێهێنانی خەڵکی سادە (ویستی بە بیانووی فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە بیانجوڵێنێت)، بە تایبەتی لە شاری (کوفە)دا، لەم نەخشەیەدا کاری خۆی لەسەر بەکارهێنانی ئەو عەرەبە خێڵەکیو نەخوێندەوارو کورتبینانە چڕکردەوە کە بە سادەترینو

---

١ تأريخ الطبري (٣٤٨/٥).
٢ تأريخ الطبري (٣٤٨/٥).

بچووکترین کارێك لە والیەکانیان ڕوویدابایە هەڵدەچوون‌و گرژ دەبوون، ئەوانەی نامەکانیان بۆ دەخوێندنەوە بە جۆش‌و خرۆشەوەو لە ڕێی باسکردنی (فەرمانکردن بە چاکەو بەرگرتن لە خراپە) دەیانخیاپاندن، داخلەدڵو چاوچنۆکەکانیش لە پڕوپاگەندەو بوختان هەڵبەستن بۆ عوسمان وەك بوختانی: (خزم خزمێنەکردن‌و خەنی کردنی خزمەکانی بە سامانی (بیت المال)و قۆرغکردنی دەسەڵات‌و سامان بۆ خۆی‌و بوختانی دیش) ڕانەدەوەستان‌و بە هۆیانەوە ڕقی ئاژاوەچیەکانیان هێندەی تر لە دژی عوسمان هەڵدەستاند. ئەمجا (کوڕی سەبەء) هانی شوێنکەوتەکانی خۆی دەدا هەواڵنامەی درۆ لەسەر شارەکانی خۆیان بنووسن‌و بۆ تەواوی شارەکانی تری بنێرن‌و تێیان بگەیەنن کە: (بارودۆخی شارەکەیان گەیشتووەتە ئەوپەڕی خراپی)، سەبەئیەکان بەم هەواڵە درۆزنانەیان دەیانەویست باوەڕ بە خەڵك بکەن‌و لە ڕێی هەڵایساندن‌و خۆشکردنی گڕو کڵپەی ئاگری ئاشوب لەنێو کۆمەڵگەی ئیسلامیدا سود وەربگرن.[1]

ئەمەو عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت) زانی لە شارەکاندا شتێك بەڕێوەیەو ئوممەت ژانی بە ئاشوبێکەوە گرتووە، بۆیە وتی: بە خوا ماری فیتنە جینگڵ دەدات‌و پێچ دەخوات، خۆشی بۆ (عوسمان) بمرێت‌و نەیجوڵێنێت.[2] (کوڕی سەبەء) لە (مصر) دانیشتبوو لە تەڕی دەخواردو لە وشکی دەنوست‌و ئەوێی کردە وێستگەی دەرچوونی بڕیارەکانی‌و هێرشەکانی بۆ سەر عوسمان ڕێکدەخستن‌و بە خاتری هەڵایساندنی بڵێسەی ئاشوب پڕوپاگەندەی دەکردو دەیوت: کە عوسمان پۆستی خیلافەتی بە ناهەق داگیرکردووەو مافی سەروەسێتی پێغەمبەری خودای خواردووە، کە مەبەستی پێی عەلی بوو، بە بەرزکردنەوەی ئەم دروشمە خەڵکی هان دەدا پەلاماری مەدینەی پایتەخت بدەن.[3] ئەمەو بە تەزویرکردنی هەندێك نامە کە گوایە لە لایەن هاوەڵە گەورەکانەوە بۆی نێردراون هەڵی خەڵەتاندن‌و بەڕێی کردن، کاتێك ئەم عەرەبە خێڵەکیانە گەیشتنە (مەدینەی مونەووەرە)و کۆبوونەوەیان بە هاوەڵان کرد، تەماشایان کرد ئەوان بە هیچ شێوەیەك بۆ ئەم کارە هانیان نادەن‌و پشتگیریان ناکەن، ئەوان هەر هەموویان بێ بەری بوونی خۆیان لە ڕاست ناردنی ئەو جۆرە نامانە نیشاندا کە خەڵك لە دژی عوسمان ڕاست دەکەنەوە.[4] تێبینیان کرد عوسمان مافەکان بە زایە نادات،

١ الدولة الأموية، يوسف العش (ص: ٦٨)، تحقيق مواقف الصحابة (١/٣٣٠).
٢ تأريخ الطبري (٥/٣٥٠).
٣ تحقيق مواقف الصحابة (١/٣٣٠)، تأريخ الطبري (٥/٣٤٨).
٤ المصدر نفسه (١/٣٣٠)، تأريخ الطبري (٥/٣٦٥).

بەڵکو ڕووبەڕوو قسەی لەگەڵ کردن‌و بەرپەرچی هەموو ئەو بوختانانەی دایەوە کە بۆی هەڵبەسترابوون‌و ڕێکوپێکی‌و ڕاست‌و دروستی کارنامەی خۆی بۆ باس کردن، تا کار بەوە گەیشت یەکێك لەو عەرەبە خێڵەکی‌و هەڵخەڵەتاوانە (کە مالیکی ئەشتەری نەخەعی بوو) بڵێ: پێ دەچێت فێڵ لە ئەویش‌و لە ئێوەش کرابێت.[1]

(ذهبي) وا دادەنێت کە: (عبدالله ی کوڕی سەبەء) هەڵایسێنەری ئاشوب بوو لە (مصر)، دەرهەق بە والیەکان تۆوی دووبەرەکی ڕقوتوڵەو بوغزوغەرەزی لە دڵودەروونی خەڵکیدا چاند، ئەمجا ئەمەی بەر والیەکان کەوت بەر ئیمام عوسمانیش کەوت،[2] ئەو هەر بە تەنها نەبوو، بەڵکو ئەو چالاکیەکانی خۆی لە چوارچێوەی تۆڕێکی پیلانگێڕدا ئەنجامدەدان، کە ژمارەیەك شێوازی فێڵبازانەو فریودەرانەیان لە سازدانی عەرەبی دەشتەکی‌و خێڵەکی‌و قورئانخوێن‌و غەیری ئەوانیش ڕەچاوکردبوون.

(إبن كثير) دەگێڕێتەوە: کە ژمارەیەك لەو هۆکارانەی بوونە مایەی گەلەکۆمەکردنی حیزب‌و گروهەکان لە بەرانبەر عوسماندا: دەرکەوتنی کوڕی سەبەء‌و ڕۆیشتنی بۆ مصرو هەڵبەستنی بوختانێك بە فیتی نەفسی خۆی‌و بڵاوکردنەوەی لەنێو خەڵکیداو هەڵخەڵەتان‌و گیرۆدەبوونی خەڵکێکی زۆری دانیشتوانی (مصر) پێیەوە،[3] بێگومان زاناو مێژوونووسە پێشین‌و پاشینە بەناوبانگەکانی ئوممەت کۆك‌و یەکدەنگن کە: (عبدالله ی کوڕی سەبەء) بە خۆی‌و بیروبۆچوون‌و نەخشەکانی خۆیەوەو بە ئامانجی تۆراندنی موسڵمانان لە ئاین‌و ئیمانیان‌و نانەوەی دووبەرەکی‌و ناکۆکی لەنێویاندا، لەنێو جیهانی ئیسلامدا سەری هەڵداو خەڵکانی ئاژاوەگێڕی لە دەورە کۆبوونەوەو ئەو (فیرقە سەبەئیە) مەشهورەی لێ پێکهێنان کە بوو بە هۆکارێکی کاریگەری نێوڕیزی هۆکارگەلی ئاشوبەکە کە کوژرانی ئەمیری ئیمانداران (عوسمانی کوڕی عەففان) (خودا لێی ڕازی بێت)ی لێکەوتەوە.

(فیرقەی سەبەئی) لە خوێندنەوەی نەخشەکانیەوە ڕێکخراوێکی یەکجار تۆکمەو پێکەوە بەستراوی لێ بەدی دەکرێت، لە ئاراستەکردنی پڕوپاگەندەکانی‌و بڵاوکردنەوەی بیروبۆچوونەکانی زیرەکانەو فێڵبازانە جوڵاوەتەوەو، جڵەوی پڕوپاگەندەکانی توند گرتووەو کاریگەری لەسەر خەڵکانی پەست‌و نزم‌و ئاژاوەگێڕو گێرەشێوێن داناوەو بەهۆی

---

١ المصدر نفسه (١/٣٣١).

٢ تحقيق مواقف الصحابة (١/٣٣٨).

٣ البداية والنهاية (٧/١٦٧، ١٦٨).

شارەزابوونی تەواوی بە تەبیعەتی عەرەبە دەشتەکیەکان‌و کۆیلەو نەتەوە ناعەرەبەکان‌و ناسینی ئەو شتانەی ئەوان ڕقیان پێی هەڵدەستێت‌و دەروونیان بۆی دەخرۆشێت‌و بەکارهێنانی هەست‌و دەماری تایەفەگەری، چالاکانە توانی خەڵکانێك لە شارەکانی (بەصرەو کوفەو مصر) بۆ خۆی دروست بکات .[١]

**هەڵوێستی معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ( خودا لێی ڕازی بێت ) لە ئاشوبەکەدا :**

ڕۆژێك لە ڕۆژانی ساڵی (٣٣)ی کۆچی، (سەعیدی کوڕی عاص)ی والی کوفە لە (کۆڕی گشتی ویلایەتدا) دانیشتبوو، خەڵکیشی لە دەورە بوو، لەنێو خۆیان وتووێژیان دەکرد، ژمارەیەك لە (خەواریجە سەبەئی)یەکان خۆیان بەنێو مەجلیسەکەدا کردو ویستیان تێکی بدەن‌و ئاگری ئاشوب هەڵ بکەن، لە کاتێکدا (سەعیدی کوڕی عاص)و یەکێك لە ئامادەبووانی کۆڕەکە –کە (خونەیسی کوڕی حوبەیشی ئەسەدی) بوو– گفتوگۆیان دەکرد، ئیدی لەسەر شتێك نەدەگەیشتنە یەکتری، حەوت کەسی خەواریجی گێرەشێوێنی سەبەئی لەوێ دانیشتبوون لەنێوانیاندا: (جوندوبی ئەزدی) –کە (سارق)ی کوڕی بە هۆی تێوەگلانی لە قەتڵێکدا حوکمی کوشتنەوەی بەسەردا چەسپابوو–، (ئەشتەری نەخەعی)و (ئیبنولکەووا)و (صەعصەعەی کوڕی صەحوان) دەبینران، ئاژاوەچیەکان هەلی ڕاجیایی نێوان (سەعیدی کوڕی عاص)و (خونەیس)یان قۆستەوەو بەم بۆنەوەو لەنێو کۆڕەکەدا هەڵیانکوتایە سەر (خونەیسی ئەسەدی)و دەستیان بە لێدانی کرد، (حوبەیش)ی باوکی ڕاپەڕی تا لەسەر خونەیس بکاتەوەو لە بن دەستیان دەربێنێت، ئیدی لەویشیان دا، (سەعید) هەوڵی دا لێیان نەدەن بەڵام بە قسەیان نەکرد، دەرەنجام کوڕو باب لە ژێر زەبری لێداندا بوورانەوەو لە هۆش خۆچوون، هۆزی (بەنو ئەسەد) بۆ تۆڵە سەندنەوە خۆیان گەیاندە ئەوێ، خەریك بوو جەنگ لە نێوان هەردوو لادا بەرپابێت، بەڵام سەعید توانی بارودۆخەکە ئاسایی بکاتەوەو هیچ نەقەوما.[٢]

کاتێك ئەم هەواڵە بە (عوسمان) گەیشت، داوای لە (سەعیدی کوڕی عاص) کرد لێزانانە کێشەکە چارەسەر بکات‌و ئەوپەڕی توانای خۆی بۆ تەسککردنەوەی بازنەی ئاشوبەکە بەکاربخات، ئیدی خەواریجە ئاشوبگێڕەکان چوونەوە ماڵ‌و لە دژی (سەعید)ی والی کوفەو (عوسمان)و دانیشتوان‌و کەسە دیارەکانی کوفە دەستیان بە پڕوپاگەندەو هەڵبەستنی درۆو

---

١ تحقيق مواقف الصحابة (١/٣٣٩).

٢ تأريخ الطبري (٥/٣٢٣).

دەلەسەو بوختانو قسەوقسەلۆك کرد، کار بەوە گەیشت دانیشتوانی کوفە لێیان هەراسان بوون، داوایان لە سەعید کرد سزایان بدات، (سەعید) وتی (عوسمان) ڕێی لێ گرتووم ئەم کارە بکەم، ئەگەر لەسەر داواکەتان سوورن، هەواڵ بە خۆی بدەن، ئەمەو پیاوماقوڵو پیاوچاکانی کوفە سەبارەت بەم ئاژاوەچیانە نامەیەکیان بۆ (عوسمان) نووسیو داوایان لێکردبوو لە کوفەیان دەربکاتو شارەکەیان لە ئاژاوەو گێرەشێوێنی ئەوان ڕزگار بکاتو دووریان بخاتەوە، (عوسمان) فەرمانی بەسەر (سەعیدی کوڕی عاص) کرد ئەو نەفەرانە ــ کە هەشت نۆ کەسێك دەبوون ـ لە کوفە دەربێنێت، ئەمەو سەعید بە فەرمانی عوسمان بەرەو (شام)ی بەڕێکردن ، عوسمان سەبارەت بەم چەند کەسە نامەیەکی بۆ (معاویە) نووسیو پێ وت: دانیشتوانی کوفە چەند کەسێکی ئاژاوەچیان لەنێو خۆدا دەرکردوونو بۆ لای تۆیان بەڕێکردوون، تۆش سامیان نیشان بدەو بیانترسێنەو ئەدەبیان دادەو بەسەریانەوە بوەستە، ئەگەر ئاقڵبوونت تێدا بەدی کردن، لێیان قەبوڵ بکە.[1] کاتێك گەیشتنە لای معاویە، (معاویە) پێشوازی لێکردنو میوانداری باشی لێ کردنو بە فەرمانی عوسمان لە عێراق چۆن ڕەفتاریان لەگەڵ کرابوو، هەمان ڕەفتاری لەگەڵ جێبەجێ کردن، بەردەوام بەیانیانو ئێواران لەسەر سفرەی خواردن لەگەڵیان دادەنیشتو نانی لەگەڵ دەخواردن، ڕۆژێك پێی وتن: ئێوە چەند پیاوێکی (عەرەب)نو خاوەن زمانو ددانی خۆتانن، بە هۆی ئیسلامەوە گەیشتنە لوتکەی شکۆمەندیو بەسەر نەتەوەکاندا زاڵ بوون، پلەوپایەو سامانی ئەوانتان بە میرات گرت، زانیومە ڕقتان لە قورەیش هەستاوە، ئەگەر قورەیش نەدەبوو، دەگەڕانەوە بۆ ئەو پەستیو نزمیەی پێشدا تێیدا بوون.[2]

عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت) دەیزانی: کە (معاویە) پیاوی کردنەوەی گرێ کوێرەکانەو زمانپاراوو ڕەوانبێژە، نەرمونیانو خۆڕاگرە، زیرەكو زرنگو لێزانێکە دەزانێ چۆن ڕووبەڕووی ئاشوب ببێتەوە، بۆیە کردنەوەی ئەم گرێ کوێرەی حەواڵەی (معاویە) کردو ئەم نەفەرانەی بۆ لا ناردن، معاویەش ئەوپەڕی هەوڵو تەقالای خۆی بە خاتری قەناعەت پێهێنان سەرف کرد: سەرەتا ڕێزی لێگرتنو تێکەڵاویان بووو لەگەڵیان دانیشت، ئیدی لەم ماوەیەداو پێش ئەوەی بەپێی تۆمەتەکانی سەریان حوکمیان لەسەر بدات توانی شارەزای نهێنیەکانیان ببێتو پەردەی سەر ڕوویان ڕامالێتو کتومت وەکو خۆیان بناسێتو بەریەستی شەرمی

---

١ الخلفاء الراشدون (ص: ١٣١).

٢ تأريخ الطبري (٥/٣٢٤).

نێـوان خـۆیو ئـەوان لابـەرێت، تەماشـای کـرد ئەوانـە هەسـتو نەسـتی تایەفەگـەری دەیانجولێنێتو حەزو ئارەزووی پۆستی دەسەڵات بە جۆشیان دێنێت، لەبەر ئەمە دەبێت لە دوو گۆشەوە بچێتە نێو بابەتەکەی ئەوانەوە:

یەکەم: کاریگەری (ئیسلام) لەسەر شکۆداری عەرەب.

دووەم: ڕۆڵـی (قـورەیش) لـە بڵاوکردنـەوەی (ئیـسلام)داو لـە ئەسـتۆگرتنی ئەرکـە قورسەکانی.

جا ئەگەر ئیسلام کاریگەری لەسەر دروسـتبوونیان هـەبووبێت ئـەوا دەبێـت ئـەم ڕاسـتیە بزانن‌و چاوەدێری بکەن، دوای ئەمە وێنەیەکی بارودۆخی عەرەبی بۆ خستنەڕوو، کە چۆن بە هۆی ئیسلامەوە ئوممەتێکی یەکگرتوویان لێ پێکهاتووەو گەردنکەچی یەك تاکە ئیمام بوون‌و ولزیان لە ژیانی پـشێویو شـەڕو هـەراو خوێنڕێـژیو بـیری ڕەگەزپەرسـتی بۆگـەن هێنـاوە،[1] (معاویە) بەردەوام قسەیان بۆ دەکاتو دەڵێت: ئیمامو پێـشەواکانتان تـاکو ئـەمڕۆ سـوپەرو قەڵغانو بەڵاگێڕی ئێوە بوون، لە ژێـر قەڵغانەکـەتان دەرمەچـن، ئێـستا سـەرکردەکانتان لـە بەرانبەر جـەورو سـتەمی ئێـوە ڕقـی خۆیـان قـوت دەدەنـەوەو خـۆڕادەگرن، ئـەرکو نازتـان دەکێشن، سوێند بە خودا: یان واز لەم بەزمـەتان دێـنن، یـان خـودا بەربـەڵاتان دەکـاتو بـە کەسێك سزاتان دەداتو خۆتانی لەبەر ڕاناگرنو بـە هـۆی تاوانەکانتانـەوە، کـە دەرهـەق بـە ڕەعێت ئەنجامتان داوە، لە لە دنیاداو پاش مردنیش دەبنە شەریكو برابەشی تاوانی ئەوانەی بەر گورزی سزاتان دەدەن، یەکێکیان وتی: ئـەوەی دەربـارەی قـورەیش باسـت لێـوە کـرد، ئەوا زۆرینەی عەرەب پێك ناهێنێتو لە سەردەمی (جاهیلی)یـشدا لـە هـەموون ئـازاو قـایمتر نەبووە، تا ئیمڕۆ بێی پێشانمان بدەیتو بە ئەو بمانترسـێنیت، ئـەوەی دەربـارەی (قـەڵغانو مەتاڵ) قسەت لێوە کرد، خۆ ئەگەر (مەتاڵ)ەکە دڕاو کون بوو ئەوا لێی ڕزگار دەبین.

معاویـە وتـی: ئێـستا ناسـیمن، زانـیم کـە: بـێ ئـەقڵیو کـەم ئاوەزیتـان ئێـوەی هەڵخەڵەتانـدووە، پـێم وا نیـە تـۆی (وتەبێـژ)یـش ئاقڵـت لـە کەللـەدا بێـت، مـن گـەورەییو مەزنایەتی ئیسلامت بۆ دەخەمەڕوو، بەڵام تۆ سەردەمی (جـاهیلی)یـم بـەبیر دێنیتـەوە؟ مـن ئامۆژگاریم کردی تۆش پێت وایە ئەو مەتاڵـەی تـۆی لـە خۆگرتـووەو پاراسـتووە، دەدڕێـتو دڕانەکەشی ناخرێتە ئەستۆی هیچ کەسێك؟ دەك خودا ئەو کەسانە سەرشۆڕ بکات کـە کـاری ئێوەیان هێندە گەورە کردو بۆ لای خەلیفەکەتانی بەرز کردەوە.[2]

---

١ (معاوية) بن أبي سفيان، لمنير غضبان (ص: ١٠١).

٢ تأريخ الطبري (٥/٣٢٤).

معاويه زانی ئـەم دەربڕینـە ئامـاژەداره قەناعـەتی پـێ نـەداون، بۆیـە سـەرەتا پێویـستە ڕوونتر باسی واقیعی (قوڕەیش)یان بۆ بكاتو وتی: تێبگەن، پێم وا نیە تێبگەن، قوڕەیش نە لە سەردەمی (جاهیلی)داو نە لە سەردەمی (ئیسلام)دا بێ لە (ألله) بە هیچ شتێكی تـر پـشت قایمو شكۆدار نەبووە، نە لە هەموو (عەشیرەتێكی تری) عـەرەب زۆرتـر بـووە، نـە ئـازاو بـە جەزرەبەتر بووە، بەڵام قورەیش ئەندامـە هـەرە گـەورە هەسـتیارەكەی جەسـتەی عەرەبـەو دڵو هەناویەتیو سەرتۆپی هەموو عەشیرەتەكانیەتیو لە هـەموانیان ڕێزدارتـرو جـوامێرترو تێرو تەواوترە، لە كاتێكداو لـە سـەردەمی (جـاهیلی)دا خـەڵكان خـەریكی خۆخـۆری بـوون، ئەوان جگە لـە (خـودا) پەنایـەكی تریـان نـەبوو لـەم بەڵایـە بیانپارێزێت، خودایـەك كەسـێك شكۆدار بكاتو پایەبەرزی بكـات، سـەری شـۆڕ نابێـتو دانانـەوێت، ئایـا جگـە لـە قـورەیش عەرەبێك، عەجەمێك، سورێك، ڕەشێك دەناسن بـەر شـاڵاوی ڕەشـەبای زەمانـە نەكـەوتبێتو ڕێزو حورمـەتو دەوڵـەتی لـە وڵاتـی خۆیـدا تێكوپێـك نەشـكابێت؟ هـەر كـەسو نەتەوەیـەك پیلانی شەڕی لە دژی دارشتبێت خودا ژێرەوژووری كردووە، تا كاتێـك خـودا ویـستی لەسـەر ئەوە بەرقـەرار بـوو: كـێ بـەڕێزە ڕزگـاری بكـاتو كـێ دنیـا بـە كـەم دەگرێـتو حیـساب بـۆ گەڕانەوەی ئەو دنیا دەكات بیخاتە سەر شارێگەی دینەكەی خۆی، بۆ ئا ئەمە ڕێكوپێكترینو باشترین مەخلوقی خۆی هەڵبژارد، هاوەڵانیشی بـۆ هەڵبـژاردن هـەرە باشـەكانیان قورەیـشی بوون، ئەمجا ئەم ئەركو دەسەڵاتەی خستە ئەستۆی ئەوانو پۆستی خیلافەتی پـێ سـپاردن، جگە لە ئەوانیش بۆ كەسی تر ناشێت، هەتا ئەوان لەسـەر دینـی خـودا بمێننـەوە، خـودا لـە پەنای خۆیان دەگرێت، ئەمە لە كاتێكدا خـودا لـە سـەردەمی جاهیلییەتـدا لـە بەرانبـەر ئـەو پاشـایانە چـەپاڵەی دان كـە ئێوەیـان سەرشـۆڕو زەبـوون كردبـوو، ئـاخ لـە دەسـت تـۆو هاوڕێكانت، دەبووایە یەكێكی ترتان قسەی كردبایە، بەڵام تۆ دەستپێشخەر بووی، بـەڵام تـۆ ئـەی (صەعـصەعە): ئاواییەكـەت خـراپترین ئـاوایی عەرەبییـە، دارای بۆگـەنترین ڕووەكو قـوڵترین دۆڵو شـیوە، بـە شـەڕەنگێزیو خـراپ هاوسـێیەتی بەناوبانگـە، هـەرگیز پیـاوێكی شەریف یان ناشەریفێك لەوێدا نیشتەجێ بووبێت جنێوێكی تێدا پێ وتراوە، ناوو ناتۆرەیەكی بۆ هەڵبەستراوە، ئەمجا ئێوە لە هەموو عەرەبێك زیاتر بە لۆمەو لەقـەب ناسـراوونو دوورەتـان زۆر تێدانو لەگەڵ ناعەرەبان تێكـەڵاوونو هاوسـنووری فارسـەكانو هـەڵگیراوەی ئـەوانن، تـۆ سـەر بـە گێـچەڵترینی نێـو هـۆی خـۆت بـووی، تـا كـار بـەوە گەیـشت بانگـەوازی پێغەمبـەر (ﷺ)تـان پێگەیـشت، بەدبـەختی خـۆت، ئـەو كاتـە پەراگەنـدەی (عومـان) بوویـتو لـە (بەحرەین) نەبوویتو بەشداری بەخششی بانگەوازەكـەی پێغەمبـەر (ﷺ) نـەبووی، تـۆ ئـەو

کلتەش خراپترین کەسی نێو هۆزەکەت بووی، تا کار بەوە گەیشت ئیسلام دەری خستی‌و تێکەلاوی خەڵکی کردی‌و هێنای تا دژایەتی ئەو گەلانە بکەی کە لە دژت ڕاوەستابوون، سینگت دێنیتە پێشەوەو لارووێری بۆ دینی خودا بڕیار دەدەی، گێرەشێوێنی دەکەیت‌و ـەتەوێت سەرشۆڕی بەسەر ئیسلام‌و ئەهلەکەیدا بێنی، ئەم کارەی تۆ: قورەیش لە پۆستی شکۆمەندی دانابەزێنێت‌و زیانیان پێ ناگەیەنێت‌و ڕێی ئەنجامدانی ئەرکەکانی سەر شانیان پێ ناگرێت.

(شیطان) لێتان خافڵ نیە، ناسیونی کە سەربەگێچەڵ‌و شەڕانی نێو ئوممەت ئێوەن، ئەو تولنیوەتی خەڵك هەڵفریوێنێت، بەلام زۆرانبازی لەگەڵ ئێوە گرتووە، ئێستا ئەو زانیویەتی کە ئەو ناتوانێت بە هۆی ئێوەوە قەزاو بڕیاری خودا بگێڕێتەوە، ناتوانێت بە هۆی ئێوەوە فەرمانێك خودا ویستی لەسەر ئەنجامدانی هەبێت ڕێی پێ بگرێت، ئێوە هەرکات بتانەوێت بە شەڕو هەرا ئامانجێك بپێکن ئەوا خودا دەرگایەکی گەورەتری شەڕتان لەسەر ئاوەلا دەکات‌و سەرشۆڕو زەبونترتان دەکات. ئەمجا هەستاو بەجێی هێشتن، ئیدی یەکدیان سەرکۆنە دەکردو هان دەدا، بەلام هەر لە کورتیان دەدا.[1]

بەم شێوەیە (معاویە) هەر هەموو وزەی فکری‌و ڕۆشنبیری‌و سیاسی خۆی بە گەڕ خست تا قەناعەتیان پێ بکات‌و تێیان بگەیەنێت.

●●● سەرەتا باسی (قورەیش)ی بۆ کردن‌و بارودۆخی ئەوانی لە هەردووك سەردەمی (جاهیلی)و (ئیسلامی) بۆ خستنەڕوو.

●●● باسی هۆزەکانی خۆیانی بۆ کردن، کە چۆن لە سەردەمی جاهیلیدا پەست‌و بێ ڕێزو داماو بوون‌و لە کەش‌و هەواو بارودۆخێکی ناسازدا دەیانگوزەراندو هەرێمەکانیان لە لایەنی سروشتیەوە بێ خێروبێر بووەو لە بواری سیاسیشەوە بە حوکمی هاوسێییەوە هەمیشە ژێر چەپۆك‌و وابەستەی (فارس) بوون، تا ئەوە بوو خودا بە (ئیسلام) ڕێزی لێنان‌و دوای سەرشۆڕی‌و سوکی‌و ڕیسوایی سەربڵندو شکۆمەندی کردن.

●●● (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) هێرش دەکاتە سەر (صەعصەعەی کوڕی صوحان)ی وتەبێژی تاقمەکە، کە چۆن خەڵکانی هۆزەکەی پێشوازیان لە ئیسلام کردو بەلام ئەو خۆی لێ دزیەوەو بە دەم بانگەوازەوە نەهات‌و پاشان گەڕایەوەو موسڵمان بووو جارێکی ترو دوای دۆڕان‌و سەرکزی بە هۆی موسڵمانبوونیەوە سەری بەرزبۆوە.

---

١ تأريخ الطبري (٥/٣٢٦).

●●● (معاویە) پەردەی سەر نەخشەو پیلانەکانی (صەعصەعە)و هاوڕێکانی هەڵماڵی، کە چۆن دەیانەوێت ئاشوب بەرپا بکەن‌و خواروخێچی بۆ دینی خودا بەرقەرار بکەن.

●●● دەری خست کە (شەیتان) سەرچاوەی سەرەکی پیلانەکانیانەو بزوێنەری ئەم شەڕەیانە، بەم شێوەیە مێژووی ئوممەتی بە (خودا) ئەمجا بە (ئیسلام)و (عەقیدە)وە بەستەوەو بەرەبەرە بۆی دەرخستن کە ئەوان وەکو پارەی قەڵب‌و ساختەن‌و، دەرەنجام بازاڕیان دەشکێت‌و بەبێ ئابڕوویی فڕێ دەدرێن، بەڵێ حەقیقەتی نەخشەو پیلانەکانی خۆیانی بۆ ڕوونکردنەوەو بە بانگەشەی سەردەمی جاهیلی بەستنەوە.[1]

ئەمجا شەوی دواتر هاتەوە لایان‌و بە دوورو درێژی قسەی بۆ کردن‌و ئەمجا وتی: ئەی گەلۆ: یان بە قسەی خێر وەڵامم بدەنەوە، یان بێ دەنگ بن، بیربکەنەوەو تەماشا بکەن چ شتێك سود بە خۆتان‌و خزم‌و کەستان‌و هۆزەکانتان‌و کۆمەڵی موسڵمانان دەگەیەنێت، ئەمە داوا بکەن‌و دەژین‌و پێتان دەژین.

(صەعصەعە) وتی: تۆ شیاوی ئەمە نیت‌و ئەگەر لە سەرپێچیکردنی خودا دابی ڕێزت نیەو گوێڕایەڵیت لێ ناکرێت.

معاویە وتی: ئەی لە سەرەتای وتەکانمدا فەرمانی تەقوای خوداو گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەرداری خوداو پێغەمبەرەکەیم پێ نەکردن‌و داوام لێ نەکردن هەر هەمووتان دەست بە بەرنامەو ڕێسمانی خوداوە بگرن‌و پەرتەوازە مەبن؟ وتیان: نا، بەڵکو فەرمانی پەرتەوازەیی پێچەوانەی قورئانت دا کە بە خەڵات بۆ پێغەمبەر (ﷺ) هاتووە!

معاویە وتی: من ئێستا فەرمانتان پێ دەکەم، ئەگەر شتێکی لەم جۆرەم وتبێت‌و کردبێت، ئەوا تۆبەی لێ دەکەم‌و فەرمان بە ئێوەش دەکەم: پارێز لە خودا بکەن‌و لێی بترسن‌و گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەرداری خودای گەورەو پێغەمبەری خودا (ﷺ) بکەن‌و پابەندی جەماعەت بن‌و ڕقتان لە دووبەرەکی ببێتەوەو ڕێز لە ئیمام‌و پێشەواکانتان بگرن‌و بە گوێرەی تواناتان ڕێی خێرو چاکەیان نیشاندەن‌و بە نەرم‌و نیانی ئامۆژگاریان بکەن، ئەگەر نەنگیەکیان هەبوو بە لوتف‌و مەرحەمەتەوە بۆیان چاك بکەن.

(صەعصەعە) وتی: ئێمە فەرمانت پێ دەکەین: لەم پۆستەت دابەزە، چونکە موسڵمانانی تر هەن لە تۆ شایانترو لە پێشترن بۆ وەرگرتنی.

(معاویە) وتی: ئەو کەسە کێیە؟

[1] (معاوية) بن أبي سفيان، للغضبان (ص: ١١١).

وتیان: کەسێکە، باوکی لە باوکت باشتر بووو زووتریش هاتە نێو ئیسلامەوە، خۆیشی لە تۆ باشترو زووتریش موسڵمان بووە.

(معاویە) وتی: سوێندبەخوا پێشینەیەکی دوورو درێژو باشم هەیە لە ئیسلامدا، خەڵکانێکی تریش هەن لە من لە پێشترن‌و پێشینەی باشتریان هەیە لە ئیسلامدا، بەڵام ئێستا بۆ هەڵگرتنی ئەم ئەرکە پێم شك نایەت کەسێکی بەهێزتر لە من هەبێت، (عومەری کوڕی خەتتاب) تەماشای کرد، ئەگەر کەسێکی تری بەهێزتری دەستکەوتبایە لایدەبردم، (عومەر) بۆ من‌و غەیری منیش هەرگیز نەرمی نەنواندووە، ئێستاش کارێکی وا خراپم ئەنجام نەداوە تا واز لە کارم بهێنم، ئەگەر (ئەمیری ئیمانداران)و (موسڵمانان) بیانزانیایە، ئەوا بێ شك (ئەمیری ئیمانداران) بە (دەستخەتو وازۆی) خۆی فەرمانی دەردەکرد، منیش وازم لە کارەکەم دەهێنا، ئەگەر خودا بڕیاری لەسەر بێت‌و عوسمان کارێکی لەو جۆرە بکات، ئومێدەوارم نیەت‌و نیازی خێر ئەمەی پێ بکات، لەسەرەخۆ! ئەم داوایەتان‌و وێنەکانیان خۆزیەو فەرمانی (شەیتان)ن، سوێند بێت، ئەگەر: کاروبارەکان بە گوێرەی خواستو بیرو ڕاکانی ئێوە بەڕێوەبرێن، ئەوا حوکومەتی ئەهلی ئیسلام شەوو ڕۆژێك خۆڕاناگرێت‌و دەڕوخێت، بەڵام خودا بڕیاری بۆ داوەو مشوری لێ دەخوات‌و ڕاوەستاوی دەکات‌و بڕیارێکەو دەیباتە سەر، کەواتە لەسەر خێر بگەڕێنەوەو پەشیمانی ڕاگەیەنن‌و قسەی خێر بکەن.

وتیان: ئێستاش دەڵێین: تۆ شایستەی ئەم پۆستە نیت.

معاویە وتی: بەڵام بە خوا، خودا گورزی تۆڵەی زۆرن، من دەترسم هێندە بە قسەی (شەیتان) بڕۆن‌و بچن، تا کار بەوە دەگات سەرپێچی کردنتان لە خودای (ڕەحمان)و گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەرداریتان بۆ (شەیتان) پەلکێشتان بکات بۆ نێو چاڵی سوك‌و ڕیسوایی دنیاو دواڕۆژو سزای هەمیشەیی خوداتان بەسەردا بسەپێت.

خۆیان بۆ هەڵداو سەرو ڕیشیان گرت.

معاویە وتی: نەکەن، بێدەنگ بن و ورتەتان لێوە نەیا!

ئێرە کوفە نیە، قەسەم بە خودا، ئەگەر خەڵکی شام چاویان لێ بووایە چ لەگەڵ ئیمام‌و پێشەواکەیان دەکەن، جڵەوم پێ نەدەگیران‌و هەر هەموویان دەکوشتن، سوێند بە خوا وتارو کردارتان بە یەك دەچن، ئەمجا هەستاو وتی: وەڵڵاهی لە ژیانمدا لەگەڵتان دانانیشمەوە.[1]

---

١ تأريخ الطبري (٥/٣٣٠، ٣٣١).

معاویـەی ئـەمیری شـام لـە دوا هـەوڵی خۆیـدا، ئەوپـەڕی توانـاو ئـاوەزو نـەرمونیانی‌و ڕۆشنبیری‌و بیرو زەینـی خـۆی بـەکارهێنا تـا بەشـکو پـەژێوانیان بکاتـەوەو دەسـتبەرداری فیتنـەو ئاشـوبیان بکـات. ئـەو بـە ئەسـپایی بـەرەو پـارێزکردن لـە خـوداو گوێڕایـەڵی‌و فەرمانبـەرداری کردنـی خـوداو پێغەمبەرەکـەی‌و پەیوەسـت بـوون بـە جەماعـەت‌و دوورەپەرێزیکردنی پەرتەوازەیی بانگ دەکردن، ئەوانیش دەیانقیڕاندو دەیانوت: تۆ لە خـودا یاخی بووی‌و گوێڕایەڵیت لێ ناکرێت.[1]

جارێکی دی بە ئاوەزی مەزنیەوەو سینگی فراوان‌و نەرم‌و نیانیەوە بە بیریـان دەخاتـەوە کە: جگە لە فەرمانبەرداریکردنی خودا داوای شتێکی تریان لێ ناکات، ئەگەر گریمان (بە پێـی بۆچوونی ئەوان) گوناهێکیشی ئەنجام دابێت، ئەوا لەبەر چاوی ئەوان تۆبەی لەسەر دەکات، ئـەمجا جـارێکی تـر بانگهێـشتیان دەکاتـەوە: تـا بێنـە ژێـر تاعەتـەوەو پابەنـد بـن بـە جەماعەتەوەو خۆیان لە پارچەپارچەکردنی ئۆممەت دووربخەنەوە، خۆ ئەگـەر ئامۆژگاریەکـە سودی پێ گەیاندبانایە، لەوانە بوو ئەم هەڵسوکەوت‌و لوتـف‌و مەرحەمەتـەی لـە بەرانبـەریان ئەنجام درا کاری تـێ کردبانایـە، تەماشـا دەکـەین (معاویـە) بـە ئاقارێکیـان دادەبـات تـا بـە شێوازێکی ئارام‌و لە کەشێکی پڕ لە ئامۆژگاری‌و دڵسۆزی‌و نەرمونیانیدا وتووێژ بکـەن، مـاڵ‌و سامانێکی فرەش لەبەر دەستدایە تا بـە هۆیـەوە ڕازیـان بکـات و ئـیتر هەرچـی لـە ناخیانـدا پەنگی خواردۆتەوە دەریخەن و تورەی بـدەن، ئـەمجا پێیـان وت: ئێمـە ئـەمرت پـێ دەکـەین دەستبەرداری پۆستەکەت بی، کەسێك لەنێو موسڵمانانـدا هەیە بۆ ئەم پۆستە شـایانتر بێـت، دەستبەجێ (معاویە) بە ئاگا هات‌و زانـی چـیان لـە دڵـی خۆیانـدا حەشـارداوە، بۆیـە حـەزی دەکـرد پـەردە لەسـەر لاتەنیـشتێکی ئـەم شـاراوە هەڵداتـەوەو لـە کۆتاییـدا بگاتـە ئـەو دەرەنجامـەی کـێ دەیانجوڵێنێـت‌و لـە پـشتیانەوە وەسـتاوەو ڕق‌و قینـەی دوژمنکارانـەیان دەخاتە هەناوەوە، بەڵام نەیاندرکاندو تـەنها بـەم ئامـاژە بڕیانـەوە کـە ئـەوان حـەز دەکـەن پۆسـتەکەی بـۆ کەسـێك چـۆڵ بکـات کـە لـەو چـاکترەو باوکیـشی لـە بـاوکی چـاکتر بـووە، هەرچەندە زۆر ناقۆڵایانە مشتومڕیان لەگەڵ دەکردو لێکدا لێکدا فەرمانیان پێ دەکرد واز لـە پۆستەکەی بێنێت، بـەڵام (معاویـە) پـشووی هەڵکێـشاو نـەرمی نوانـد. ئـەو بـە بـیری تیـژی

---

[1] المصدر نفسه (٥/٣٣٠).

سیاسیانەیو هەڵوێستی سەرکردانەی خۆی وەڵامێکی تیروتەواوی دانـەوەو لـە شـەش خـاڵی سەرەکیو گرنگداو بە پوختی بۆی خستنەڕوو:

١ـ ئەو لە ئیسلامدا هەم پێشەکی باشی هەیەو هەم هەنگاوی چاکیشی ناون، دوابەدوای مردنی (یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان)ی برای (خودا لە هەموویان ڕازی بێت) بۆتە پێشمەرگەو پاسەوانی سەنگەرە سەرسنوورییەکانی ئیسلام لە شامدا.

٢ـ کەسانێك لەنێو موسـڵمانانـدا هـەن لـە ئـەو باشـترو بـەڕێزترنو پێـشینەی باشـتریان هەیەو زیاتر تووشی چەرمەسەری بوون، بەڵام پێی وایە کە ئەو لە پاراستنو پاسەوانیکردنی ئەم سنوورە بەرفراوانو گەورە ئیسلامیەی (شام)دا لە هەموانیان بـەهێزو بـە توانـاترە، ئـەو ئەو کاتەوە جڵەوی کاروباری (شام)ی گرتووەتـە دەسـت، توانیویـەتی ڕێکـی بخـاتو هێنـدە مشوور لە دانیشتوانەکەی خواردووە لەگەڵیان تێکەڵاو بووە تا ئەوەی خۆشیان ویستووە.

٣ـ عومەری کوڕی خەتاب (خودا لێی ڕازی بێـت) تەرازوویـەکی هەسـتیارو پێـوەرێکیو وردبینە بۆ هەڵسەنگاندنو نرخاندنی والیـەکان، زاتێکـە لەبـەر خـودا لۆمـەی لۆمـەکارانیێ بـە خەیاڵدا نەدەهات، ئەگەر سەرپێچی یان لادانێکی لە (معاویـە)دا دیبایـە سـزای دەداو لەسـەر کـاری لادەبـرد، ئەمـە لـە کاتێکـدا (معاویـە) لـە درێـژەی خیلافـەتی ئـەودا والی شـام بـووە، هەروەکو چۆن پێشی ئەویش، پێغەمبەری خودا (ﷺ) کاری پێ سپاردبووو کردبوویە کـاتبی بەردەستی خـۆی، ئـەمجا (ئەبوبـەکری صـدیق)یـش کـاری پـێ سـپاردو هـەر لـە سـەردەمی پێغەمبەرەوە (ﷺ) تا ئەو کاتە کەس ڕەخنەی لە شایستەبوونی نەداوە.

٤ـ دابەزین لە پۆستی کاربەدەستی بەنـدە بـەو هۆکارانـەوە کـە دابەزینەکـە پێویـست دەکەن، کەواتە با جارچیانی ئاشوبو هەرا بەڵگە هەقەکان بخەنەڕوو تا لەسەر بنەمای ئەمـە دابەزینەکە بێتەجێ.

٥ـ ئەو کەسەی بڕیاری لەسەر کار لابـردن یـان بڕیـاری هێـشتنەوە دەدات کێیـە؟، ئـەم پڕوپاگەندەچـیانە یـان ئـەمیری ئیماندارانـە؟ بێگومـان ئەمـە مـافی (عوسمـان)ی ئـەمیری ئیماندارانەو کاری دامەزراندنی والیەکان یان لێخستنیان مافی ئەوە.

٦ـ هەر ڕۆژێك ئەمیری ئیمانداران عوسمانی کوڕی عەففان بڕیاری لەسەر کار لابردنی بۆ (معاویە) دەکرد، ئەوا ئەو ئیمانی وایە فەرمانەکەی بەخێر بۆ ئەو دەشکێتەوەو بەبێ چەندو

چوون‌و دوو دڵی وەکو ئەمیرێکی فەرمانبەسەرداکراو فەرمانی خەلیفەی موسڵمانان قەبوڵ دەکات.[١]

کۆتایی دانیشتنەکە زۆر بە ئاخوئۆفوئێش‌وژان بوو، ئەو لە بەرانبەر سزاو تۆڵەو تووڕەیی خوداو گەردنکەچییان بۆ هەواو هەوەس‌و ئەنجامدانی سەرەڕۆیی ئاگاداری کردنەوە، بەڵام ئەوان لە بەرانبەر ئەمەدا چ هەڵوێستێکیان ئەنجام دا؟، ئەوان خۆیان بۆ هەڵداو سەرو ریشی معاویەیان گرت، لەو کاتەدا پاڵی پێوەنان‌و سەرکۆنەی کردن‌و قسەیەکی توندو تیژو هەڕەشەئامێزی ئاراستە کردن، تێگەیشت کەوا: ئەمانە مەحاڵە ملکەچی هەق بن، بۆیە پێویستە کاروباریان بگەیەنرێتە عوسمانی ئەمیری ئیمانداران‌وچاو بە پێناسی خەتەرناکیاندا بخشێنێتەوەو بڕیارێکی تریان بۆ دەر بکات.[٢]

## نامەیەکی (معاویە) بۆ عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت) سەبارەت بە خەڵکانی ئاشوبگێڕی کوفەیی:

معاویە نامەی بۆ عوسمان نووسی‌و وتی: بەناوی خودای بە بەزەیی بەخشندە.

بۆ (عوسمان)ی بەندەی خوداو ئەمیری ئیمانداران، لە (معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان)ەوە:

پاش ئەمە، ئەی ئەمیری ئیمانداران: چەند کەسێکت بۆ لا ناردووم بە زمانی شەیاتینی قسە دەکەن‌و شتی زۆریان لە دڵی خۆ گرتووە، بە درۆی خۆیان قورئان پەیڕەو دەکەن‌و دەچنە لای خەڵك‌و هەق‌و نامەقیان لێ تێکەڵ دەکەن‌و دەرەنجام سەریان لێ تێك دەدەن، هەموو خەڵك نازانن چیان دەوێت، ئەوانە پەرتەوازەیی ئۆممەتیان گەرەکەو پەیامی فیتنەو ئاشوبیان هەڵگرتووە، بە (ئیسلام)ەوە سەغڵەتن‌و هارۆژاون، شەیتان دڵی داگیرکردوون‌و بە پیلانی ئەو خەڵکێکی زۆری شاری کوفەیان تێکداوە، من هیچکەیان لێ ئەمین نیم، هەتا بە فرت‌و فێڵ‌و سیحرو جادووی خۆیان سەریان لە خەڵکی شامیش تێکنەداوە، بیانگێڕەرەوە با لەو شوێنە جێگیر بن کە بە نیفاقەکەیانەوە سەریان تێدا هەڵداوە.[٣]

عوسمان نامەی بۆ سەعیدی کوڕی عاصی والی کوفە نووسی‌و گێڕانیەوە بۆ لای ئەو، هەر کە گەڕانەوە زارو زمانیان لێ دەرهێنان، سەعید نامەی بۆ عوسمان نووسی کە لێیان

---

١ (معاوية) بن أبي سفيان، صحابي كبير، وملك مجاهد (١١٤_١١٧).

٢ (معاوية) بن أبي سفيان للغضبان (١١٧_١١٨).

٣ تأريخ الطبري (٥/٣٣١).

هەراسان بووە، عوسمان نامەی بۆ سەعید نووسیەوەو فەرمانی پێکرد بەرەو لای (عبدالرحمن ی کوڕی خالیدی کوڕی وەلید)ی والی (حمص)یان بەڕێ بکات.[١] کاتێك گەیشتنە (حمص) عبدالرحمن بانگی کردنو بە توندی قسەی لەگەڵ کردن، لەو قسانە:

ئەی ئامرازانی دەستی شەیتان: دەك بە ملی شکاو بێنو بە خێر نەیەن، شەیتان بە داخو حەسرەتەوە کۆڵی داوە، کەچی ئێوە لەسەر ناهەقیتان چالاكو گورجو گۆڵن ، دەك خودا (عبدالرحمن) ڕەنجەڕۆ بکات ئەگەر نەتوانێت سەرشۆڕتان بکاتو تەمبێتان نەکات! ، ئەی کەسانێك کە کەس نازانێت ئێوە عەرەبن یان عەجەمن، فزەتان لێوە نەیەتو ئەو قسانەی بە (سەعیدو معاویە)تان وتووە بە منی نەڵێن، من کوڕی (خالیدی کوڕی وەلید)م، من کوڕی ئەو کەسەم کە هەموو کەس بە دەعبا کێویەکانیشەوە سامیان لێ دەکردو زمانیان لە بەرانبەریدا لاڵوپاڵ دەبوو، من کوڕی ئەو کەسەم هەڵگەڕاوەکانی گێڕانەوە، وەڵلاهی سەرتان پێ دادەنەوێنم! .

ئەمەو (عبدالرحمن) ماوەی مانگێك لە لای خۆی هێشتنەوە، بەوپەڕی توندوتیژی هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەنواندن، وەکو (سەعیدو معاویە) نەرمی بۆ نەکێشان، ئەگەر ڕۆیشتبایە لەگەڵی دەڕۆیشتن، بە سواری ڕۆیشتبایە بە سواری لەگەڵی دەردەچوون، کە غەزای کردبایە غەزایان لەگەڵ دەکرد، لە هەموو بۆنەیەکدا سەرشۆڕو خەجاڵەتی دەکردن، هەرکات ڕووبەڕووی (صەعصەعەی کوڕی صوحان)ی ئەمیریان ببوایەوە پێی دەوت: ئەی حەرامزادە، ئایا نازانی ئەگەر کەسێك چاکە چاکی نەکات، شەڕ چاکی دەکات، کەسێك نەرمونیانی باشی نەکات، توندوتیژی باشی دەکات؟ پێی دەوتن:

باشە بۆ بە دەستووری سەعیدی کوفەو معاویەی شام وەڵامم نادەنەوە؟ بۆ وەکو وان گفتوگۆم لەگەڵ ناکەن؟ ئەمەو شێوازەکەی (عبدالرحمن) سوودی گەیاند ، لە بەرانبەریان لەسەر هەستو توندو تیژو دڵڕەق بوو، دەرەنجام کڕو ماتو لاڵو پاڵ بوون، تۆبەو پەشیمانی خۆیان نیشانداو وتیان: دەگەڕێینەوە لای خوداو داوای لێخۆشبوونی لێ دەکەین، ئازادمان بکە خودا ئازادت بکات، لێمان ببوورە خودا لێت ببووڕێت، ئیدی ئەم تاقمە نەفیکراوە لە لای (عبدالرحمن)و لە وڵاتی (جزیرە) مانەوە، (عبدالرحمن) ویستی هەواڵی پاشگەزبوونەوەی ئەم تاقمە لە ئاشووبگێڕیو تۆبەکردنو چاکبوونیان بە عوسمان ڕاگەیەنێت، بۆ ئەمە (ئەشتەری نەخەعی)ی یەك لە سەرانی ئەو تاقمەی بۆ لای (عوسمان)

---

١ تأريخ الطبري (٥/٣٣١).

بەڕێکرد، (عوسمان) بە (ئەشتەر)ی وت: ئەتۆو هاوڕێکانت کوێتان حەز لێیە لەوێ دانیشن، ئەوا من بڕیارم دا لێتان ببوورم، (ئەشتەر) وتی: دەمانەوێت ماوەیەك لە جزیرەو بە لای (عبدالرحمن)ەوە بمێنینەوە، ئەمەو لەم ماوەیەدا وایان خۆ نیشان دەدا تۆبەیان کردووەو چاکبوونەوەو هاتوونەتە سەر ڕاستە شەقام.[1]

لەم چەند مانگانەی ساڵی (٣٣)ی کۆچیداو لە ماوەی دوورخرانەوەی سەرانی ئاشوبەکە بۆ لای (معاویە) لە شامو عبدالرحمن لە جزیرە، بەڵێ لەم ماوەیەدا خەڵکانی ئاشوبگێڕو ئاژاوەچی نێو کوفە پێیان وابوو بەرژەوەندی وادەخوازێت بێ دەنگ بن.[2] بەڵام تەواوی جارچیانی ئاشوب لە شوێنەکانی تری وەکو (بصرە ، مصر)و شوێنانی تریش لەسەر کاری خۆیان بەردەوام بوون، لە ساڵی (٣٤)ی کۆچیداو لە ساڵی یازدەهەمی خیلافەتی عوسماندا، (عبدالله ی کوڕی سەبەء) نەخشەی پیلانەکەی بە تەواوەتی داڕشتو (تاقمەی سەبەئی) ڕێکخستو بە گژ خەلیفەو والیەکانیدا کرد، ئەمەو ئەم (جووە) لە مصری کولانەی پیلانەکەیەوە پەیوەندی بە تەواوی شەیاتینیەکانی حیزبەکەی خۆیەوە کرد لە (بەصرەو کوفەو مەدینە)، نامەو نوێنەری بۆلاناردنو ئەوانیش نامەو نوێنەریان بۆ لاناردنو لەسەر چۆنیەتی دەرچوونو ڕاستبوونەوە لە دژی خەلیفەو والیەکانی ڕێکەوتن، ئەو هەشت نۆ دە نەفەرەی (کوفە)، کە بۆ (شام)و پاشان بۆ (جزیرە) دوورخرابوونەوە لە ڕیزی ئەو کەسانەدا بوون کە (سەبەئی)یەکان نامەگۆڕینەوەیان لەگەڵ ئەنجام دەدان، دوابەدوای دوورخرانەوەی ئەمانە، (یەزیدی کوڕی قەیس) ببووە سەرۆکی سەبەئیە داخ لە دڵەکانی کوفە.[3]

لە ساڵی (٣٤)ی کۆچیدا، تەواوی پیاوماقوڵو خەڵکە باشەکەی کوفە بەرەو جیهادی ڕێگەی خودا دەرچووبوون، جگە لە خەڵکانی ئاشوبگێڕو بەرەڵاو گۆشکراو بە فرچکی بیروبۆچوونی پیسی سەبەئیەکان کەسی تر لە شاردا نەمابوو، ئەمانە لە دژی (سەعیدی کوڕی عاص)ی والی کوفە ڕاستکرانەوە.[4] (قەعقاعی کوڕی عەمروی تەمیمی)ی سوپاسالاری جەنگی کوفە توانی کۆتایی بە یەکەمین ڕاپەڕینی سەبەئیەکان بێنێت کە لە کوفە داو بە سەرکردایەتی(یەزیدی کوڕی قەیس) ئەنجام درا، کاتێك (یەزید) بیرتیژیو بە ئاگاییو ئازایەتیو توندو تیژی (قەعقاع)ی بە چاوی خۆی دی، نەخشەو ئامانجی سەرۆکی

---

١ تأريخ الطبري (٣٢٧/٥).

٢ الخلفاء الراشدون للخالدي (١٣٤).

٣ الخلفاء الراشدون للخالدي (١٣٥).

٤ الخلفاء الراشدون للخالدي (١٣٥).

دەرچوونەکەیانی بۆ ئاشکرا نەکرد کە خۆی لە شۆڕش کردن لە دژی (عوسمان)و لێخستنی دا دەبینیەوە، وتی: کە هەموو داوایەکی خۆیو تاقمەکەی ئەمەیە: (سەعیدی کوڕی عاص) لە پۆستی ویلایەتی کوفە لاچێتو والیەکی تری بێتەجێ، ئەمەو (قەعقاع) پاش بیستنی قسەکانی یەزید وەڵامی داواکەیانی دانەوەو هەر هەمووی ئازادکردن، ئەمجا یەزید وتی: بۆ پێکانی ئەم ئامانجە لە مزگەوت دامەنیشەو با کەس دەورت لێ نەدا، بڕۆ لە ماڵی خۆت دانیشەو ئەوەی دەتەوێت لە خەلیفەی داوا بکە، بە ئیزنی خودا جێبەجێ دەبێت.[1] ئیدی (یەزید) بەردەوام ئاگری فیتنەو ئاشوبی هەڵدەهایساندو پاش فرتوفێڵێکی زۆرو دەستکاری کردنی ناچاریانەی نەخشەی دەرچوون، ئاشوبگێڕانی نێو کوفە بە سەرکردایەتی (یەزید) بڕیاریاندا نەیەڵن (سەعیدی کوڕی عاص)ی والی بێتەوە نێو شار.[2]

کاتێك سەبەئیە گێرەشێوێنەکان بە مەبەستی نانەوەی هەراو پشێوی هەڵگەڕانەوەو دەرچوون، خەڵکە ژیرو پیاوچاکەکانی کوفە چوونە (مزگەوت)، (عەمروی کوڕی حورەیسی)ی جێگری والی چووە سەر مینبەرو داوای لە موسڵمانان کرد یەکێتیو برایەتی ئەنجام بدەنو خۆ لە پەرتەوازەییو ناکۆکیو ئاشوبو دەرچوون بپارێزنو بە دەم بانگەشەی هەڵگەڕاوەو یاخییەکانەوە نەچن.[3] (قەعقاعی کوڕی عەمروی تەمیمی) وتی: دەتەوێت لافاو بگێڕیتەوە سەرچاوەکەی؟ دەکە دەتوانی بەر بە سێڵاوی فورات بگرەو مەهێڵە بە ڕێی خۆیدا بڕوات، هەیهو، هەیهو، جگە لە شمشێری (مەشرەفییە) هیچ شتێکی تر سەرکوتیان ناکات، هاکا لە کالان دەرکێشراو ئەمجا وەکو گیسکی یەك ساڵە دەبارێنن، ئەمجا ئاوات بۆ ئەو دۆخە دەخوازن کە پێشدا تێیدا بوون، هەرگیز نایەنەوە سەری.

کەواتە ئارام بگرە، وتی: ئارام دەگرم،ئیدی بەرەو ماڵی خۆی ڕۆیشتەوە.[4]

ئاشوبگێڕانی کوفە بەربینگیان بە (سەعیدی کوڕی عاص) گرتو نەیانهێشت بێتەوە نێو شارو بەرەو مەدینە بەڕێکەوت، بە پێی ڕای خۆی: حیکمەت وا دەخوازێت بەرەو ڕوویان نەبێتەوە، ئاگری ئاشوب هەڵنەکرێت، بەڵکو دەبێ هەوڵ بدرێت خامۆش بکرێت، یان بە لانی کەم هەڵایسانەکەی دوابخرێت، دوای گەیشتنی بە (مەدینە) دەنگوباسەکەی بە (عوسمان) ڕاگەیاند، (عوسمان) پێی وت: ئەوانە چیان گەرەکە؟ دەستیان لە تاعەتو گوێڕایەڵی

١ تأريخ الطبري (٣٣٧/٥).
٢ المصدر نفسه (٣٣٨/٥).
٣ الخلفاء الراشدون، للخالدي (ص: ١٣٩).
٤ تأريخ الطبري (٣٣٨/٥).

دەرکێشاوە؟ یان لە دژی (خەلیفە) هەڵگەڕاونەتەوەو ڕایگەیاندووە فەرمانبەرداری لێ نەکەن؟ سەعید وتی: نا، وتوویانە: کە نایانەوێت من والی ئەوان بمو دەیانەوێت والیەکی تر بچێتە جێی من.

(عوسمان) وتی: دەیانەوێت کێ والییان بێت.

(سەعید) وتی: (ئەبو موسای ئەشعەری)یان دەوێت.

(عوسمان) وتی: ئەوە دیاریمان کرد، (ئەبو موسا)مان کرد بە والی بە سەریانەوە، سوێند بێ بە خوا، بەهانەو بەڵگەی هەموو کەس دەبڕین، ئەوەی لەسەر ئێمە پێویستە بۆیان جێبەجێ دەکەینو خۆڕاگرانە لەگەڵیان دەڕۆین تا ئەو شوێنەی دەردەکەوێت چیان دەوێت، ئەمەو (عوسمان) نامەی بۆ (ئەبو موسا) نووسیو هەواڵی پێدابوو کە کردوویەتی بە والی کوفە.[1]

(ئەبو موسا) هەر خەریکی ئاساییکردنەوەی بارودۆخەکە بوو، بەری بە خەڵك دەگرت سەرپێچی بکەنو یاخی ببن، پێی دەوتن: ئەی خەڵکینە: لە ژێر فەرمان دەرمەچنو خۆتان مەخەنە نێو ناکۆکیەوە، یاخی مەبنو پابەندی جەماعەتو تاعەت بن، تاڵوکە مەکەنو ئارام بگرن، هێندەی نەماوە والیەکتان لە لایەن (عوسمان)ەوە بۆ دەنێردرێت، پێیان وت: پێشنوێژیمان بۆ بکە، وتی: نایکەم، بە مەرجی گوێڕایەڵیو فەرمانبەرداری (عوسمانی کوڕی عەففان) نەبێت، وتیان: بە شەرتی سەمعوتاعە بۆ (عوسمان) پێشمان بکەوە.[2] ئەم قسەیان بە قەستی بوو و درۆیان دەکردو ئامانجەکەیان لە خەڵك پەنهان دەکرد.

(ئەبو موسا) تا نامەکەی عوسمانی بۆ هاتو فەرمانی پێکرا ببێتە والی (کوفە)، ئیمامەتی بۆ خەڵك دەکرد.

هەروەها (عوسمان) نامەیەکی بۆ دەرچووەکانی کوفە ناردو بۆی نووسیبوون: پاش ئەمە: ئەو کەسەم کرد بە والیتان کە بۆ خۆتان هەڵتانبژاردبوو، لە (سەعید)م قوتار کردن، بە خوا هەر شتێکی بە نرخو نایابم هەیە دەیخەمە بەر پێتانەوە، هەموو سەبری خۆمتان بۆ سەرف دەکەم، هەموو هەوڵوتەقالایەکم دەخەمە گەڕ هەتا ئاشتتان بکەمەوە، چتان پێ خۆشە لێم داوا بکەن، سەرپێچی بوونی خودای تێدا نەبێت، دەتاندەمێ، لە چ شتێکیش بێزارنو ڕقتان لێیەتی سەرپێچی خودای تێدا نەبێت هەوڵ دەدەم نەیهێڵێنو بە حەزی ئێوە

---

١ تأريخ الطبري (٥/٣٣٩).

٢ تأريخ الطبري (٥/٣٣٩).

شتێکی تری لە جێ دادەنێین، ئەمە بە خاتری ئەوە بیانوبڕ بنو بەڵگەتان لەسەرم نەمێنێت، ئەمەو عوسمان هاوشێوەی ئەم نامەیەی بۆ هەموو شارەکانی تر نووسی.[١]

دەك خودا لە عوسمانی ئەمیری ئیمانداران ڕازی بێت، ئای چەند چاكو سینگ فراوان بوو!، تەماشا ئەم سەبەئیە یاخیە داخلەدڵانە چەندەیان جەورو ستەم دەرهەق ئەنجامدا.

**ڕاوێژکردنی (عوسمان) بە والی ولاتو شارەکانو ڕاوبۆچوونی (معاویە) لەسەر ئەمە:**

(عوسمانی کوڕی عەففان) بە چەند شێوازێکی جۆراوجۆر ڕووبەڕووی ئاشووبەکە بۆوە، ئەم شێوازانە: ناردنی چەند لیژنەیەکی پشکنینو لێکۆڵینەوە بۆ ولاتەکان، هەوڵدان بۆ زانینی ئامانجو مەبەستی ئاشوبگێڕەکان، توانی خۆ بە نێو ڕیزەکانیاندا بکاتو بە گفتوگۆو مشتومڕو بە دەمەوەچوونی هەندێك لە داواکانیان بیانوەکانیان ببڕێتو بە بەڵگەوە لە بەرانبەریان ڕاوەستێت، لە کتێبی (عثمان بن عفان -رضي الله عنه-)دا بە دوورو درێژی باسی سیاسەتو هەڵسوکەوتی عوسمانم کردووە لە بەرانبەر ئاشوبەکەدا.

ڕاوێژکردنی بە والی ولاتو شارەکان، شێوازێك بوو لە ڕستەی ئەو شێوازانەی (عوسمان) بە خاتری چۆنیەتی ڕەفتارکردن لەگەڵ ئاشوبەکە گرتیەبەر. نوێنەری بۆ لا ناردنو داوای لێکردن بە پەلە بگەنە (مەدینە)، والیەکان ئەمانە بوون: (عبداللە ی کوڕی عامر، معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان، عبداللە ی کوڕی سەعد، عەمروی کوڕی عاص، سەعیدی کوڕی عاص) ،هەروەها کۆنە والیەکانیشی بانگ کردن، کۆڕێکی داخراوی بۆ بەستن، هەر ئامادەبوویەك ڕای خۆی دەربڕی، (معاویە) ڕای خۆی ڕاگەیاندو بە عوسمانی وت: ڕام وایە فەرمان بە میرانی سوپا بکەی بەرانبەریان بوەستنەوە، هەریەك لەو میرانە دەرۆستی خەڵکانی ئاشوبگێڕی ژێر دەسەلاتی خۆی دێت، منت بەسە بۆ ئاشوبگێڕانی شام.[٢]

پاش بیستنی ڕاوپێشنیاری بەشداربووان (عوسمان) هەستایە سەرپاو سوپاسو ستایشی خودای کردو وتی: هەر هەموو ڕاو پێشنیارەکانی ئێوەم بیست، هەر شتێك دەرگای پێداچوونەژوورەوەی خۆی هەیە، ئەو شتەی مەترسی لێ دەکرا بەسەر ئوممەتدا بێت دروست بووە، تەنها شتێك نەهێڵی دەرگا داخراوەکەی بکرێتەوە نەرمونیانیە، بە دواداچوونی خەڵكو کاروکردەوەکانیان لە سنووری خودادا نەبێت- کەس ناتوانێت بە شورەیی دانەنێ، بەرگرتن بە کرانەوەی ئەم دەرگای ئاشوبە-نەرمونیانیو لەسەرخۆییە، سوێند بێت بە خودا ئەوە

---

١ المصدر نفسه (٣/٣٤٣).

٢ الكامل في التأريخ (٢/٢٧٨)، تأريخ الطبري (٥/٣٥١).

خەریکە دەکرێتەوە، کەسیش بەڵگەو بەهانەیەکی هەقی لە بەرانبەر مندا پێ نیە، خودا دەزانێت کە من دەرهەق بە کەس کەمتەرخەمیم نەنواندووە، بە خوا ئەوا گوریسی ئاشوب‌و ئاژاوە دەڵێی مارە جینگڵ دەخوات‌و دێت‌و دەچێت، خۆشی بۆ عوسمان بمرێت‌و نەیجوڵێنێت، خۆتان لەو خەڵکانە لادەن، مافەکانی خۆیان پێ بدەن‌و لێیان ببوورن، ئەگەر هاتوو مافەکانی خودا هێرشیان کرایە سەر سازشیان لەسەر نەکەن.[1]

ئەمەو عوسمان ڕێگەی بە والیەکانی نەدا جڵەوبەدەستانی ئاژاوەگێڕیەکە بەند بکەن یان بیانکوژن، بڕیاریدا بە خۆشی‌و نەرمونیانی ڕەفتاریان لەگەڵ بنوێنن،[2] داوای لێکردن بگەڕێنەوە سەر کارەکانی خۆیان‌و بەو شێوازەی پێی ڕاگەیاندن هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەو ئاشوبە بکەن کە هەموو لایەك چاوی لێبوو بەڕێوەیە.[3]

(معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان) بەر لە گەڕانەوەی بۆ شام، هاتە لای (عوسمان)و پێی وت: ئەی ئەمیری ئیمانداران، پێش ئەوە کارەساتەکان ڕوو بدەن‌و هێرشت بکرێتە سەرو نەتوانی بەرەنگاری ببیتەوە لەگەڵم وەرە بۆ شام.

(عوسمان) وتی: من هاوسێنشینی پێغەمبەری خودا (ﷺ) بە هیچ شتێك نافرۆشم، ئەگەر بڕینی دەماری ملمیشی بە سەرەوە بێت.

معاویە وتی: کەواتە بە خاتری بەرەنگاربوونەوەی مەترسیە چاوەڕوانکراوەکان‌و پاسەوانیکردنی تۆو دانیشتوانی مەدینە سوپایەکت لە (شام)ەوە بۆ دەنێرم.

عوسمان وتی: نا بەهۆی نیشتەجێکردنی سەربازو پاسەوانان نامەوێت گرانی‌و کەمبوونەوەی خوردو خۆراك بەسەر هاوسێیانی پێغەمبەری خودا (ﷺ)دا بێنم‌و کوچەران‌و پشتیوانان تەنگەتاو بکەم.

معاویە وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران: قەسەم بە خودا ـ چاوم لێیە ـ، شەڕت پێ دەفرۆشرێت‌و ڕەشەکوژ دەکرێیت.

عوسمان وتی: خودام بەسەو باشترین کارپێسپێردراوە (حسبي الله ونعم الوكيل).[4]

هەموو ئەو شتانەی (معاویە) پێشبینی دەکردن‌و چاوەڕێی دەکرد ڕوو بدەن ڕوویاندا، تاقمە ئاشوبگێڕەکان بە ئامانجی گەمارۆدانی (عوسمان)و پاشان ڕەشەکوژکردنی هاتنە

---

١ تأريخ الطبري (٥/٣٥١).

٢ خلافة عثمان، د. السلمي (ص: ٧٧).

٣ الخلفاء الراشدون، للخالدي (ص: ١٥١).

٤ تأريخ الطبري (٥/٣٥٣).

مەدینە، کاتێك ئەم تاقمانە لە هەموو هەرێمە جۆراوجۆرەکانەوە هاتن، نە کەس نە تاقمێکی دانیشتوانی (شام)یان تێدا نەدەدیترا،[١] لەوەی ڕابورد دەبینین ئێمە لە بەرانبەر (والی)یەکی وا گەورە وەستاوین، کە لە نێو والیەکانی تردا هەڵکەوتوانە شەقڵ بەڕێ لێدەداتو زیاتر لە لوتکەی ویلایەت بەرز دەبێتەوە، توانی هەرێمی (شام) ئامادە بکاتو بیکاتە سەرتۆپی تەواوی هەرێمەکانی دەوڵەتی ئیسلامی، وای وادار کرد بە ڕێکوپێکترین شێوە گوێڕایەڵیو فەرمانبەرداری سەرکردایەتی بکاتو ئاسایشی تێدا بەرقەرار کردو نەیهێشت هۆکارەکانی ئاشوبو ناکۆکی تێدا سەرهەڵ بدەن، ئەمەی لە شامدا بینیمان لە هەرێمەکانی تردا نەبوو.[٢]

## کوژرانی عوسمان ( خودا لێی ڕازی بێت )و هەڵوێستی هاوەڵان لە بەرانبەریدا:

عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت) گەمارۆکەی لەسەر توند کرا، کار بەوە گەیشت ڕێگەی گیرا بچێتە مزگەوتو ئامادەی نوێژ بێت، چۆن پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمانی پێکردبووو نەخشەی بۆ کێشابوو ئاوای دەکردو لەسەر ئەم بەڵاو وەیشوومەیە خۆڕاگر بوو، لەگەڵ ئیمانی بەهێزی بە قەزاوقەدەر، هەوڵی دەدا چارەیەك بۆ موسیبەتەکە بدۆزێتەوە، دەبینین جارێك سەبارەت بە حەرامی خوێنی موسڵمان وتار بۆ خەڵك دەداتو پێیان دەڵێت: کە نابێت بە هەقی خۆی نەبێت بڕژێت، جارێکی تریش سیفەتە ڕازاوەکانی خۆی دەخاتە ڕوو باسی هەموو ئەو خزمەتە گەورانەی دەکات، کە لە ئیسلامدا پێشکەشی کردوونو تەواوی (١٠) موژدە پێدراوەکەی بەهەشتیش (خودا لێیان ڕازی بێت) دەکاتە شایەدی قسەکانی،[٣] وەکو ئەوە بڵێ: ئەرێ هەیاران کەسێك ئەمە سیفەتەکانی بنو ئەوەش کاروکردەوەکانی بن، دەگونجێت چاو ببڕێتە دونیاو لە پێش (دواڕۆژ)ی دابنێت، ئایا دەچێتە ئەقڵەوە ئەو کەسە سپاردە بە زایە بداتو گەمە بە سامانو خوێنی ئوممەتەوە بکات، کە دەزانێت سزاکەی چیە؟ ئایا کەسێك لە ژێر چاودێری پێغەمبەری خودا (ﷺ) پەروەردە بووبێتو پێغەمبەرو هاوەڵانی بەڕێز شایەدی چاکیو پاکیان بۆ دابێتو تەمەنی لە (٧٠) تێپەڕی کردبێتو نزیکی (٨٠) بووبێتەوە، دەبێ خەڵك ئاوا هەڵسوکەوتی لەگەڵ بنوێنێت؟ ئیدی هەڵگەڕاوەکان بەسەر (مەدینە)دا زاڵ بوونو لە زۆربەی کاتەکاندا پێشنوێژیان بۆ خەڵك دەکرد.[٤]

---

١ عبدالله بن سبأ، للعودة (ص: ١٥٢).

٢ أثر العلماء في الحياة السياسية (ص: ٧٦).

٣ خلافة علي بن أبي طالب، عبدالحميد علي (ص: ٨٥).

٤ سير أعلام النبلاء (٣/٥١٥).

ئەمجا هاوەڵان حەقیقەتی مەسەلەکەیان بۆ دەرکەوت‌و ئەوەی ئەوان دایاننابوو ئەوە نیە، ترسان شتێك ڕوو بدات پاشەڕۆژەکەی بەدفەڕ بێت، هەواڵیان پێگەیشتبوو کە ئەو خەڵکە هارۆژاوە بە نیازن عوسمان بکوژن، بۆیە پێشنیاریان بۆ کرد ڕێگەیان بدات بەرگری لێ بکەن‌و ئاژاوەچیەکان لە مەدینە دەر بکەن، بەڵام ئەو بە بەڵگەی ئەوە نایەوێت خوێن بە هۆی ئەوەوە برژێت پێشنیارەکەی ڕەت کردەوە،[١] گەورە هاوەڵان بەبێ پرس‌و ئیزنی عوسمان کوڕەکانی خۆیان بۆ پارێزگاری لێکردنی ئەو نارد، (حەسەنی کوڕی عەلی)و (عبدالله ی کوڕی زوبێر) (خودا لە خۆیان‌و باییان ڕازی بێت) لە ڕیزی ئەو پارێزەرانە بوون، عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت) (حەسەن)ی زۆر خۆش دەویست‌و ڕێزی لێ دەنا، جا کاتێك ئاشوبەکە ڕوویداو عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت) ئابلۆقە درا، لە تاو ئەوە نەبادا (حەسەن) تووشی هیچ زیانێك بێت، سوێندی لە (حەسەن) خوارد کە دەبێت بۆ ماڵ بگەڕێتەوە.[٢]

(عوسمان) بە (حەسەن)ی وت: برازاکەم! بگەڕێوە تا خودا بڕیاری خۆی دەنێرێت.[٣]

هەموو ئەو ڕیوایەتانەی باس لە برینداربوونی (حەسەن) دەکەن لە ڕۆژی گەمارۆداندا (صحیح)ن.[٤]

جگە لە (حەسەن)، (عبدالله ی کوڕی زوبێرو محمدی کوڕی حاطب‌و مەڕوانی کوڕی حەکەم)یش لەو ڕۆژەدا بریندار بوون، (حوسێنی کوڕی عەلی‌و عبدالله ی کوڕی عومەر)یش خودا لە هەموانیان ڕازی بێت وێڕای تاقمەکەی پارێزەری عوسمان بوون.[٥]

(عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) گەورەترین بەرگریکار بوو لە عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت)، (مەروانی کوڕی حەکەم) گەواهی ئەمەی بۆ داوە.[٦]

هەروەها (إبن عساکر) لە (جابری کوڕی عبدالله)وە (خودا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە، کە (عەلی) بۆ لای (عوسمان)ی نارد: پێنج سەد نەفەری زرێپۆشم لەگەڵە، مۆڵەتم پێ بدە لەو خەڵکە بتپارێزم، خۆ تۆ گوناهێکی وات نەکردووە خوێنی خۆتی پێ حەڵاڵ بکەی، وەڵامی دایەوە: خوا خێرت بنووسێت، حەز ناکەم خوێنی کەس بە هۆی منەوە برژێت.[٧]

---

١ فتنة مقتل عثمان (١/١٦٧)، صحيح الاسناد.

٢ تاريخ المدينة، لإبن شيبة (٤/١٢٠٨).

٣ الرياض النضرة، نقلاً عن (الحسن بن علي ودورة السياسي)، (ص: ٤٦).

٤ الطبقات لإبن سعد (٨/١٢٨)، بسند صحيح.

٥ تاريخ خليفة (ص: ١٧٤).

٦ تاريخ الاسلام (ص: ٤٦٠، ٤٦١)، إسناده قوي.

٧ تاريخ دمشق (ص: ٤٠٣).

ڕیوایەتی زۆر هەن دەبنە بەڵگە بۆ (عەلی) کە لە کاتی ئابلۆقەدا لایەنگرایەتی (عوسمان)ی کردووە، لەو ڕیوایەتانە:

ئاژاوەگێڕە هارۆژاوەکان ئاویان لە عوسمان قەدەغە کرد، خەریك بوو هەموو ئەندامانی خێزانەکەی لە تینوان بخنکێن‌و بمرن، عەلی (خودا لێی ڕازی بێت) سێ کوندەی پڕ لە ئاوی بۆ ناردن، تا ئاوەکەیان پێگەیشت چەند خزمەتکارێکی (بەنی هاشم‌و بەنی ئومەییە) لە ڕێی گەیاندنیدا بریندار بوون، زنجیرەی ڕووداوەکان خێرا بەسەر یەکدا هاتن، ئاشوبگێڕەکان هەڵیانکوتایە سەر عوسمان‌و کوشتیان (خودا لێی ڕازی بێت‌و لە خۆی ڕازی بکات)، هاوەڵان کە زۆرینەیان لە مزگەوت بوون هەواڵەکەیان پێگەیشت، عەلی بە کوڕو برازاکانی وت: کە ئێوە لەبەر دەرگا بوون، (عوسمان) چۆن کوژرا؟! هەرچەندە حەسەن برینداریش ببوو، بەڵام زللەیەکی لێدا،[1] کوڵەمستێکی بە سینگی (حوسێن) کێشاو بە توڕەییەوە قسەی بە (عبداللە ی کوڕی زوبێر)و (کوڕی تەلحە) وت، بە تووڕەییەوە بەرەو ماڵ گەڕایەوەو دەیوت: دەك بە درێژایی زەمانە دەستتان بشکێت، خودایە من بەریم لە ڕژانی خوێنی ئەو، من بەریم لەوە دەستم لە کوشتنیدا یان لە دەستلەپشتدانی خەڵکدا هەبووبێت لە دژی.[2]

بەڵێ، هەڵوێستی عەلی (خودا لێی ڕازی بێت) بەم شێوازە بووە، دڵسۆزی‌و ڕاوێژو گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەرداری بۆ خەلیفەو ئەمیری ئیمانداران بووە، لە کاتی ئاشوبەکەدا ئازایانەو شێلگیرانە لایەنگری کردووەو لە هەموو کەس زیاتر بەرگری لێکردووە، قەت بە خراپە ناوی نەهێناوە، هەوڵی دەدا نێوانی خەلیفەو دژەبەرانی چاك بکاتەوە، بەڵام ڕەوشەکە لە سەرووی وزەی ئەوو دەرەوەی بازنەی ویستی ئەودا بوو، ئەمە ویستی خودای بەرزو مەزن بوو تا ئەمیری ئیمانداران عوسمانی کوڕی عەففان (خودا لێی ڕازی بێت) بە پلەو پایەی شەهادەت شاد ببێت‌و[3].... خراپەکارانیش بە گوناهو تاوانەوە بگەڕێنەوە.

(عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران (خودا لێی ڕازی بێت) کوشتنی عوسمانی تاوانبار کردو بەری بوونی خۆی لە خوێنڕژانی ڕاگەیاند، لە وتارەکانیداو کۆڕو کۆبوونەوەکانیدا سوێندی لەسەر ئەمە دەخواردو دەیوت: کە ئەو نەیکوشتووەو فەرمانی بە کوشتنی نەکردووەو گەلەکۆمەی لە دژ دروست نەکردووەو بە کوشتنی ڕازی نەبووە، ئەم ڕیوایەتە لە چەند ڕێبازێکی

١ إبن أبي عاصم (الآحاد والمثاني) (١/١٢٥)، نقلاً عن خلافة علي (ص: ٨٧).

٢ مصنف إبن أبي شيبة (١٥/٢٠٩) إسناده صحيح.

٣ المصدر نفسه (١٥/٢٠٩) إسناده صحيح.

جۆراوجـۆرەوە هـاتووەو چەسـپاوە، کـە پلـەی (قطعـي)و (تـەواتور)ی وەرگرتـووە.[١] بـە پێچەوانەی گومانی بەدی (شیعەی ڕافیزە) کە گوایـە: (عـەلی) بـە کوشـتنی (عوسمـان) ڕازی بووە.[٢]

(حاکم) دوای هێنانی هەندێك ڕیوایەت لەسـەر کـوژرانی عوسمـان (خـودا لێـی ڕازی بێـت) دەڵێت: بەڵام ئەوەی بیدعەچیەکان بانگەشـەی بـۆ دەکـەن کـە گوایـە (ئـەمیری ئیمانـداران) دەستی لە یارمەتیدانی کوشـتنەکەدا هـەبووە، ئـەوا ئەمـە درۆودەلەسـەو بوختانـە، هـەواڵو ڕیوایەتەکانی پێچەوانەی ئەمە پلەی (تەواتور)یان هەیە.[٣]

(إبن تیمیة) دەڵێت: ئەمانە هەر هەموویان درۆودەلەسـەن لـە دژی (عـەلی) هەڵبەسـتراون، (عەلی) بەشداری ڕشتنی خوێنی (عوسمـان)ی نـەکردووە، فـەرمانی کوشـتنی دەرنـەکردوەو، پێشی ڕازی نەبووە، ئەمـە لـە خـۆی ڕیوایـەتکراوەو بێگومـان ئـەویش ڕاستبێژترو چاکەکار بووە.[٤]

عەلی (خـودا لێـی ڕازی بێـت) وتـی: خودایـە پاکانـەی خـۆم سـەبارەت بـە ڕژانـی خـوێنی عوسمان لە بەرانبەر تۆدا ڕادەگەیەنم،[٥] هەندێك کتێبی مێـژوویی بـە هـۆی هێنرانـی ڕیوایەتـە لاوازو دانراوەکانی مـەڕ ئاشـوب لـە مێژوونامـەی ئیمـامی (طـبري)و چـەند مێژوونامـەی تـردا هەڵوێستی هاوەڵانیان لە بەرانبەر فیتنەی کوژرانی عوسماندا شێواندووە، ئەم ڕیوایەتانە کـە لـە ڕێـی (أبـي مخنـف و واقـدي و إبـن أعـثم و غـەیری ئەمانـەوە) باسـکراونو بـە شـێوازی دوژمنکارانەو پێچەوانەی مێژووی ڕاست هەڵبەستراونو وا دەخەنە بەرچاوی خەڵك کە گوایـە: خودی هاوەڵان پیلانەکەیان ڕێکدەخستو دەجوڵاندو ئاشوبیان هەڵدەهایساندو هەرچی (أبی مخنف)ە مەیلی شیعەگەری هەبوو و خۆی لە تاوانبـارکردنی (عوسمـان) نەدەپاراسـتو پێـی وابوو کە ئەو خەلیفەیەکی خـاوەن هەڵـەی بـێ ژمار بـووەو ئـەوەی دەرهـەقی ئـەنجام درا هەقی خۆی بوو، ئەو لە ڕیوایەتەکانیدا (طلحة) بە نموونە دێنێتەوە کە گوایە یەکێك بـووە لـە شۆڕشچیەکانو گەلەکۆمەی لە دژ دروست کردووە.

---

١ البداية والنهاية (٢٠٢/٧).

٢ العقيدة في أهل البيت بين الافراط والتفريط (ص: ١٢٩).

٣ المستدرك (١٠٣/٣).

٤ منهاج السنة (٤٠٦/٤).

٥ العقيدة في أهل البيت (ص: ٢٢٩)، الطبقات لإبن سعد (٣/٣) إسناده حسن.

هەرچی ڕیوایەتەکانی (واقدی)یشە، لەگەڵ ڕیوایەتەکانی (أبی مخنف) جیاواز نین، لەم بوارەدا ڕیوایەتێکی زۆری شیعە هەن‌و تێوەگلانی هاوەڵان لە پیلانگێڕانی دژی عوسمان دەخەنەڕوو دەڵێن: گوایە خودی ئەوان جوڵێنەری شۆڕشەکە بوون‌و خەڵکیان لە دژ ڕاست کردۆتەوە، ئەم ڕیوایەتانە هەر هەموویان درۆودەلەسەو بوختانن.[1]

بەڵام سوپاس بۆ خودا بە پێچەوانەی ڕیوایەتە لاوازو هەڵبەستراوەکان، فەرموودەناسان لە کتێبەکانیاندا ڕیوایەتە (صحیح)ەکانیان بۆ تۆمارکردووین‌و پاراستوویانن، ئەم ڕیوایەتانە پشتیوانی بەرگریکردنی هاوەڵان لە عوسمان‌و بەری بوونی ئەوان لە کوشتنی‌و[2] داواکردنەوەی تۆڵەی خوێنی بە ناهەق ڕژاوی دەردەخەن، بەم جۆرە بە دوور دادەنرێت کە هاوەڵان تۆزقاڵێك بەشداری ئاشوبەکەیان کردبێت‌و دەستیان لە جولاندن‌و فوپێداکردنیدا هەبووبێت.[3]

تێکڕای هاوەڵان (خودا لێیان ڕازی بێت) لە بەرانبەر ڕژانی خوێنی عوسماندا بەری‌و پاکن، هەر کەسێك پێچەوانەی ئەمە بڵێ، ئەوا قسەکەی پوچەو ناتوانێت بەڵگەیەکی وا بێنێتەوە خۆی لە پلەی (صحیح)دا، لەبەر ئەمەیە (خەلیفە) لە مێژوونامەکەی خۆیداو لە (عبدالاعلی)ی کوڕی (هیثم)ەوەو ئەویش لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت: بە (حەسەن)م وت: ئایا لە ڕیزی بکوژانی (عوسمان)دا کەسێك لە کۆچەران‌و پشتیوانان بەدی دەکرا؟ وتی: نەخێر، هەر هەموویان (علوج)[4] بوون‌و لە (مصر)ەوە هاتبوون.

ئیمامی (نەوەوی) دەڵێت: کەسێك لە هاوەڵان بەشداری کوشتنی عوسمانی نەکردووە، بەڵکو خەڵکانی گرگن‌و بودەڵەو خوێڕی‌و بەرەڵا خێڵەکییەکان کوشتوویانە، ئەوانە لە مصرەوە هاتن‌و گەلەکۆمەیان لێکردو هاوەڵانی ئامادەبوو لە بەرانبەر گێڕانەوەیاندا دەستەپاچە بوون، ئەوان تا ئەو کاتەی کوشتیان لە لای بوون (خودا لە عوسمان‌و ئەوانیش ڕازی بێت).[5] زوبەیر (خودا لێی ڕازی بێت) بە (غەوغا) واتە پەست‌و بودەڵەی شارەکان گێرەشێوێنانی نێو خێڵەکان وەصفی کردوون.[6]

١ تحقیق مواقف الصحابة (٢٠/١٤ـ١٨).
٢ خامس الخلفاء الراشدون الحسن بن علي، للصلابي (ص: ١٢٢).
٣ تحقیق مواقف الصحابة (٢٠/١٤ـ١٨).
٤ علیج یان علوج: شۆڕەتە بۆ کەسانی کەللەوشك‌و توندڕەو: (عثمان بن عفان) للصلابي (ص: ٤٥٠).
٥ شهید الدار: عثمان بن عفان، (ص: ١٤٨).
٦ شرح النووي على صحیح مسلم (١٥/١٤٨).

(إبن تیمیة)ش بە دەرچوو گەندەڵ‌و گومڕاو یاخی‌و دەستدرێژیکار وەصفیان دەکات.[١]

(ذهبي) بە شەڕانی‌و خوێڕی‌و پەڕیدە وەصفیان دەکات.[٢]

(إبن عمادی حەنبەلی) لە (الشذرات)دا بە خەڵکانی پەست‌و نزم‌و تێکەڵ‌و پێکەڵی نێو خێڵەکان وەصفیان دەکات.[٣]

هەڵسوکەوتەکانیان هەر لە سەرەتای گەمارۆدانەوە تا کوشتنی زاڵمانەو دوژمنکارانەی خەلیفە (خودا لێی ڕازی بێت) دەبنە بەڵگەی ئەم وەصفە قێزەونانەیان، باشە چۆن ئاوو خۆراك لە زاتێکی ئاوا قەدەغە دەکرێت، کە بە سامانی تایبەتی خۆی‌و بە بەلاش تینوایەتی موسڵمانانی بە ئاوی سازگار شکاندووە،[٤] هەر کات برسێتی‌و نەهاتی‌وقاتی و گرانی‌و ناخۆشی ڕووی لە خەڵك بکردبایە بە بەخشینی سامانی زۆر بەشداری نەهێشتنی دەکرد، ئەو بە حوکمی زەنگینی‌و ئیمان بەهێزیەکەی هەمیشە ماڵی خۆی بەسەر خەڵکدا دەبەخشیەوە، بە تایبەتی کە خەڵك تەنگەتاو بوونایەو ناگوزوری یەخەی گرتبانایە.[٥]

کاتێك عەلی (خودا لێی ڕازی بێت) ڕووبەڕووی ئابلۆقەدەران دەبێتەوەو سەرکۆنەیان دەکات‌و ئەم وەصفانەی عوسمانیان بۆ باس دەکات‌و دەڵێت:

ئەی خەڵکینە: ئەوەی ئێوە دەیکەن بە کاروکردەوەی ئیمانداران ناچێت، بەڵکو بە کردەوەی کافرانیش ناچێت، ئاوو کەلوپەل‌و خۆراك لەم پیاوە قەدەغە مەکەن، (فارس‌و ڕۆم) خەڵك بە دیل دەگرن‌و خواردن‌و خواردنەوەشیان پێ دەدەن.[٦]

هەواڵە ڕاستەکان‌و ڕووداوە مێژووییەکان چەند بارەپاتی دەکەنەوە: کە هاوەڵان (هەر هەموویان) بەرین لە ڕاستکردنەوەو هاندانی خەڵك لە دژی عوسمان‌و بە هیچ کلۆجێك بەشداری ئاشوبەکەی دژی ئەویان نەکردووە.[٧]

کێ لەمە زیاتری دەوێ با کتێبی (تیسیر الکریم المنان في سیرة عثمان بن عفان) بخوێنێتەوە.[٨]

---

١ منهاج السنة (٢/١٨٩، ٢٠٦).

٢ دول الاسلام للذهبي (١/١٢).

٣ تحقيق مواقف الصحابة (١/٤٨٢)، شذرات الذهب (١/٤٠).

٤ تيسير الكريم المنان في سيرة عثمان بن عفان (ص: ٤٥٠).

٥ التمهيد والبيان (ص: ٤٢٤).

٦ تاريخ الطبري (٥/٤٠٠).

٧ تحقيق مواقف الصحابة (٢/٨).

٨ عثمان بن عفان للصلابي (٤٥١-٤٦٦).

# باسی سێیەم
# معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان لە سەردەمی ئەمیری ئیمانداران ( عەلی کوڕی ئەبوتالیب )دا ( خودا لێیان ڕازی بێت )

معاویە لە سەردەمی عومەرو عوسمان دا (خودا لێیان ڕازی بێت) والی شام بوو، کاتێك (عەلی) بوو بە خەلیفە ویستی لایبەرێت، دیارە لێرەدا گوشارێك لە لایەن ئاشوبگێڕو شۆڕشچیەکانەوە لەسەر عەلی هەبووە تا ئەم بڕیارە دەرکات، بە تایبەتی ئەوان بە چاکی معاویەیان دەناسی، بۆیە ئەم هۆیەم خستە پێشەوە چونکە پەیوەندی نێوان (عەلیو معاویە) تا سەردەمی خیلافەتی (عەلی) خۆش بووەو هیچ شتێکی وایان لە نێواندا نەبووە کە تێکیدا، هەروەکو چۆن پاشان ئاشوبگێڕان گوشاریان خستە سەر (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران‌و (قەیسی کوڕی سەعد)یان پێ لە ویلایەتی (مصر) لێخستو لەمەدا سەرکەوتنیان بەدەست هێناو دەرەنجام (مصر) لەدەست دەرچوو، لە کتێبی (أسمى المطالب في سيرة أمير المؤمنين علي بن أبي طالب)دا ئەمەم بە دوورو درێژی باس کردووە.

ئەمەو (عەلی) ئەمیری ئیمانداران (عبدالله ی کوڕی عومەر)ی هەڵبژاردو بڕیاریدا لە جێی (معاویە)ی دانێ، (عبدالله) بە بەهانەی هەبوونی خزمایەتیو ژنو ژنخوازی لە نێوان ئەوانو بنەماڵەی معاویەدا وەرگرتنی پۆستی ویلایەتی (شام)ی قەبوڵ نەکرد،[1] (عەلی)ی ئەمیری ئیماندارانیش تووڕەی لێ نەکردو داواکاری نەچوونە (شام)ی لێ قبوڵ کرد، بەڵام ئەم ڕیوایەتانەی دەڵێن گوایە: (عبدالله ی کوڕی عومەر) بە هۆی خۆلادان لە بەرپرسیاریو لایەنگری نەکردنی (عەلی)، لە لایەن (عەلی)یەوە هێرشی کراوەتە سەر، ئەوا بێ شك ئەم هەواڵە شێوێنراوەو درۆیەکی هەڵبەستراوە.[2]

مەسەلەی (عبدالله ی کوڕی عومەر)و (ویلایەتی شام) بەس گەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە (ذهبي) لە ڕێگای (سوفیانی کوڕی عویەینە)وە، ئەویش لە (کوڕی نافیع)ەوەو ئەویش لە (نافیع)باوکیەوەو ئەویش لە (عبدالله ی کوڕی عومەر)ەوە بۆمان دەگێڕێتەوە: (عبدالله ی کوڕی عومەر) وتی: (عەلی) بۆ لای ناردمو پێی وتم: ئەی (باوکی عبدالرحمن)! تۆ پیاوێکی وای دانیشتوانی (شام) گوێڕایەڵو فەرمانبەردارت دەبن، ئەوا کردمی بە فەرمانڕەوایانو هەستە بەڕێکەوەو بڕۆ بۆ ئەوێ، منیش وتم: توخوا، بۆ خاتری ئەو نزیکایەتیو هاوەڵاتیەی

---

١ المصنف لإبن أبي شيبة (٤٧٢/٧) إسناده صحيح.

٢ إستشهاد عثمان ووقعة الجمل (ص: ١٦٠).

لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ)م هەبووە لێم گەڕێ، لێی قبوڵ نەکردم، (حەفصە)م بە گژەوەنا هەر قبوڵی نەکرد، منیش شەو دەرچووم بەرەو مەککە ڕۆیشتم.[١]

ئەمە بەڵگەیەکی چەسپاوە لەسەر بەیعەتدانی (عبدالله ی کوڕی عومەر) بە (عەلی)و چوونە ژێر فەرمانی ئەوەوە، دەنا چۆن (عەلی) بەبێ بەیعەت لێوەرگرتنی ڕاستەوخۆ دەیکاتە (والی)؟!

(ابن عبدالبر) لە (الاستیعاب)دا لە ڕێگای (أبو بکری کوڕی ئەبو جەهم)ەوە دەگێڕێتەوە، (عبدالله ی کوڕی عومەر) لە کاتی گیانەڵادا وتی: مەراق لە هیچ شتێك ناخۆم، جگە لەوە کە: لەگەڵ عەلی (خودا لێی ڕازی بێت) لە دژی تاقمە یاخیەکە نەجەنگام.[٢]

ئەم ڕیوایەتەش بەڵگەیە لەسەر بەیعەتدانی بە (عەلی)، چونکە ئەو تەنها بۆ ئەوە پەژێوان بۆتەوە کە لەگەڵ (عەلی) بۆ جەنگی یاخیان دەرنەچووە، ئەو خۆی لە ئاشوبەکە دوورەپەرێز کردو لە جەنگو هەرادا لایەنگری کەسی نەکرد، خۆ ئەگەر بەیعەتیشی پێ نەدابا ئەوا چاکتر پەشیمانی بۆ دەردەبڕی‌و زیاتر مەراقی بۆ دەخوارد، چونکە بە بەڵگەی خودی ڕیوایەتی (عبدالله ی کوڕی عومەر) کاتێك خەڵك بە گشتی تۆقەی بەیعەتیان لەگەڵ کەسێك کرد، ئەوا واجبە تەواوی تاکەکانی تریش بەیعەت بکەن‌و پێیەوە پابەند ببن‌و کەسێکیش خۆی لێ دوا بخات هەڕەشەی سزای لەسەرە، (عبدالله ی کوڕی عومەر) دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: ((من مات ولیس في عنقه بیعة، مات میتة جاهلیة))[٣] واتە:هەر کەسێك بمرێت‌و بەیعەتێکی لە ئەستۆدا نەبووبێت، ئەوا بە مردنێکی نەفامانە دەمرێت.

کەواتە مەسەلەی بەیعەتدان بە (عەلی) شتێك نیە هاوەڵان تێیدا ناکۆك‌و جیاواز بووبن، بەڵکو مەسەلەی چوونەدەر بۆ جەنگ لەگەڵ (عەلی) لە ئارادا بووە، ژمارەیەك هاوەڵی تریش لەگەڵی دەرنەچوون، گریمان (عبدالله ی کوڕی عومەر) بەیعەتی نەدابوو بە (عەلی)، ئەی باشە چۆن دێتە زەینەوە بۆ بەشدارینەکردنی جەنگەکە پەشیمان بووبێتەوە، بەڵام بەیعەتەکەی بە خەیاڵدا نەهاتبێت‌و بۆی پەژێوان نەبووبێتەوە؟! ئەمە لە حاڵێکدا بەیعەتنەدان ئەم هەڕەشە توندەشی لەسەر بێت؟!

---

١ سیر أعلام النبلاء (٣/٢٢٤) رجاله ثقات.

٢ الاستیعاب (٦/٣٢٦)، بحاشیة کتاب (الاصابة).

٣ مسلم، کتاب: الإمارة، رقم (١٨٥١).

بەم شێوازە بیروڕای ئەو چەند مێژوونووسانە پوچ دەبێتەوە کە دەڵێت: گوایە (عبدالله ی کوڕی عومەر) بەیعەتی بە (عەلی) نەداوە.

بەڵکو بە بەڵگەی (صحیح) چەسپاوە کە (عبدالله) دەستبەجێ بەیعەتی پێداوە، ئەویش لە بەرانبەردا ڕاستگۆیی‌و دڵسۆزی‌و لایەنگری ڕاستەقینەی تێدا خوێندۆتەوە، بۆیە سوور بووە لەسەر ئەوە پۆستێکی باڵای بداتێ‌و لەم ڕێیەوە پشتی خۆی پێ قایم بکات.[۱]

پاش ئەوە (عبدالله ی کوڕی عومەر) سەبارەت بە چوونە شام‌و وەرگرتنی پۆستی ویلایەتی ئەوێ بەهانەی هێنایەوەو قبوڵی نەکرد، (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران (سوهەیلی کوڕی حونەیف)ی لە جیاتی ئەو نارد، بەڵام هێندەی نەمابوو بگاتە بەرزاییەکانی (شام) ئەسپسوارانی (معاویە) پێشیان پێگرت‌و وتیان: ئەگەر لە لایەن (عوسمان)ەوە نێردراوی بەخێر بێی، ئەگەر لە لایەن کەسێکی تریشەوە نێردراوی بگەڕێوە،[۲] شیاوی باسە ئەو کاتە وڵاتی شام لە تاو کوژرانی ستەمکارانەی (عوسمان) خرۆشابوو و مەنجەڵی ڕقوتۆڵە قوڵپی دەدا.

## یەکەم: ڕاجیایی هاوەڵان سەبارەت بە شێوازی تۆڵە سەندنەوە لە بکوژانی عوسمان:

ناکۆکی (تەڵحەو زوبێرو عائیشە)و پاشانیش (معاویە) لەگەڵ (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران بە خاتری ئەوە نەبوو کە ئەوان ڕەخنە لە خیلافەت‌و ئیمامەتی (عەلی)ی بگرن‌و پێیان وابێ شایانی وەرگرتنی ئەو پۆستە نەبێت‌و توانای نەبێت کاروباری گشتی موسڵمانان بەڕێوەبەرێت، نەخێر، بەڵکو هەموو هاوەڵان بە یەکدەنگ (إجماع) دەنگیان بۆ خیلافەت‌و ئیمامەتی ئەودا.

(ابن حزم) دەڵێت: هەرگیز (معاویە) نکۆڵی مەزنایەتی‌و شکۆداری (عەلی) نەکردووەو نەیوتووە موستەحەقی پۆستی (خیلافەت) نیە، بەڵام (ئیجتیهاد)ەکەی گەیاندیە ئەو ڕادەیەی سەندنەوەی تۆڵەی عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت) بخاتە پێش بەیعەتدانەوە، پێی وابوو خۆی لە هەموو کەس لە پێشترە داوای تۆڵەی خوێنی عوسمان بکاتەوە.[۳]

---

۱ الانتصار للصحب والآل (ص: ٥٠٧).

۲ تهذيب تاريخ دمشق (٣٩/٤)، خلافة علي، اعبد الحميد (ص: ١١٠).

۳ الفصل في الملل والأهواء والنحل (١٦٠/٤).

(إبـن تيميـة) دەڵێـت: کاتێـك (معاويـە) لەگـەڵ (عـەلی) دەجـەنگا، بانگەشـەی پۆسـتی خیلافەتی بۆ خۆی نەکردو لەبەر ئـەوەش جـەنگی لەگـەڵ نـەکرد چـونکە (خـەلیفـە)یـە، یـان شایستەی خیلافەت نیە، هەموو موسـڵمانان دانیـان بـە خیلافەتەکەیـدا دێنـا، هـەر کەسـێك سەبارەت بە خیلافەتی عـەلی پرسـیاری لـە (معاويـە) کردبایـە دانـی پێـدا دەهێنـا، معاويـەو لایەنگرانی بڕیاریان نەدابوو لە دژی عەلی جەنگ بکەن‌و دەستی خۆیان ڕەپێشخەن، نـەخێر، ئەوان ئەمەیان نەکرد،[1] هەروەها دەڵێت: هیچ کامێك لە گروهـەکانی ئـەو سـەردەمە –لەگـەڵ ئەوەدا لەگەڵ (عەلی) ناکۆکیش بوون– بەڵام پێیان وانەبوو (معاويـە) خـۆ لـە شـانی (عـەلی) بدات‌و، لە کاتێکدا (عەلی) بە خەلیفە دانـراوە خەلیفەیـەکی تـریش هـەبێت، بـە لای ئەوانـەوە (عەلی) وەکو هەرسێ براکەی پێش خۆی (ئەبوبـەکرو عومـەرو عوسمـان) (خـودا لێیـان ڕازی بێـت) شـکۆدار بـوو و هـیچ کامێـك لـە سـیفەتە بـەرزەکانی ئـەویان لـە پایـەداری‌و سـابیقەو زانیاری‌و دینداری‌و ئازایەتی‌و تێکڕای سیفەتەکانی تریان نادیدە نەدەگرت.[2]

بێگومان ناکۆکیەکە لەسەر بابەتی خیلافەتی ئەمیری ئیمانداران (عەلی کـوڕی ئـەبوتالیب) (خودا لێی ڕازی بێت) سەری هەڵنەدا، بەڵکو لەسەر مەسـەلەی تۆڵـە سـەندنەوە لـە بکـوژانی عوسمـان دروسـت بـوو، ئـەوان لەسـەر ئەسـڵی مەسـەلەکە ڕایـان جیانـەبوو، بـەڵکو لەسـەر چۆنیەتی گرتنەبەری ئەو ڕێبازەی مەسەلەکەی پێ چارەسـەر دەکـرا جیـاواز بـوون، چـونکە (عەلی)ی ئەمیری ئیمانـداران وەکـو ئـەوان بـە واجبـی دەزانـی تۆڵـە لـە بکـوژانی (عوسمـان) بکرێتـەوە، بـەڵام بـە ڕای ئـەو دەبێـت ئەمـە بـۆ کـاتی دوای ئاسـایی بوونـەوەی بـارودۆخ‌و سـەقامگیربوونی کاروبارەکـان‌و یەکخسـتنەوەی بڕیارەکـان دوابخرێـت، بـێ شـك ئـەم ڕایـە ئامانجپێکراوەکان بوو.[3]

(نووي) دەڵێت: بزانە: بەیەکچوونی مەسەلەکان هۆکاری ڕوودانـی ئـەم جەنگانـە بـوو، بـە حوکمی زۆر بەیەکچوونیان ئـەو ئیجتیهادانـەی لەسـەریان دەرچـوون بـۆ سـێ بەشـی جیـاواز دابەش بوون:

بەشی یەکەم: بە ئیجتیهاد بۆی دەرکەوت کە هەق بە لای ئەو لایەنەیەو نەیارەکەی یاخی (باغ)یە، کەواتە واجبە لەسەریان سەریخەن‌و جەنگ لە دژی لایەنی یاخی بەرانبەریدا بکـەن،

---

١ مجموع الفتاوى (٣٥/٧٢).

٢ المصدر نفسه.

٣ أحداث وأحاديث فتنة الهرج (ص: ١٥٨).

بەم عەقیدەیانەوە ئەمەیان کردو وتیان کەسێك ئەمە بۆچوون‌و بیروباوەڕی بێ بۆی حەلاڵ نیە خۆی لە سەرخستنی سەرۆکی دادپەروەر (ئیمامی عادل)و کوشتاری لایەنی یاخی بەرانبەری دوابخات.

بەشی دووەم: پێچەوانەی بەشی یەکەم بوون: بە ئیجتیهاد بۆیان دەرکەوت هەق بە لایەنەکەی ترە، کەواتە واجبە پشتیوانی لێبکەن‌و جەنگ لە دژی لایەنی نەیاریدا بکەن.

بەشی سێهەم: بابەتەکانیان لێ تێکەڵ بوون‌و واقیان وڕماو بۆیان دەرنەکەوت کامیان هەقە تا پەسەندی بکەن، لەبەر ئەمە خۆیان لە هەردولا لادا، خۆلادان بە نیسبەت ئەوان واجب بوو، چونکە جەنگان لە دژی هیچ موسڵمانێك حەلاڵ نیە تا دەرنەکەوێت موستەحەقی ئەمەیە، ئەگەر ئەمانە بە ئیجتیهادی خۆیان لایەنێك لەم دوو لایەنەیان پێ پەسەند کردابایەو بیانزانیایە لەسەر هەقە، ئەوا بۆیان دروست نەبوو خۆیان لە سەرخستنی ئەو لایەنەو کوشتاری لایەنە دژەبەرەکەی دوا بخەن.[١]

## دووەم: جەنگی (صفین) (٣٧)ی کۆچی

### زنجیرەی ڕووداوەکانی پێش جەنگەکە

### ١ــ (ئومو حەبیبەی کچی ئەبی سوفیان) کراسەکەی (عوسمان) بە (نوعمانی کوڕی بەشیر)دا بۆ (معاویە)و دانیشتوانی شام دەنێرێت:

کە عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت) کوژرا، دایکی ئیمانداران (ئوموحەبیبەی کچی ئەبی سوفیان) وەڵامی بۆ کەسوکاری (عوسمان) نارد: ئەو کراسەم بۆ بنێرن کە عوسمان تێیدا کوژراوە، ئەوانیش کراسە بە خوێنشەلاڵبووەکەیان لەگەڵ ئەو چەند تاڵە مووەی کە لە ڕیشیان هەڵکەندبوون بۆ نارد، بانگی (نوعمانی کوڕی بەشیر)ی کردو بۆ لای معاویەی نارد، ئەویش ئەو شتانەو نامەکەی ئوموحەبیبەی هەڵگرت‌و بەڕێکەوت.[٢] لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە: (نوعمانی کوڕی بەشیر) بەڕێکەوت‌و کراسە بەخوێنسووربووەکەی عوسمان‌و چەند سەرپەنجەیەکی قرتاوی (نائیلە)ی هەڵگرتبوو کە لە کاتی بەرگری کردن لە عوسمان قرتێنرابوون.[٣] (نائیلەی کچی فەرافیصەی کەلبی) هاوسەری (عوسمان) بوو لە هۆزی (کەلبی) شام بوو.[٤]

---

١ شرح النووي على صحيح مسلم (١٤٩/١٥).

٢ تاريخ الاسلام في عهد الخلفاء الراشدين (ص: ٥٣٩).

٣ البداية والنهاية (٥٣٩/٧).

٤ تاريخ الدعوة الاسلامية لمحمد جميل (ص: ٣٩٨).

(نوعمان) گەیشتە شام‌و هاتە لای (معاویـە)، ئـەویش بـۆ ئـەوەی خـەڵك ببیینێـت لەسـەر مینبەری دانا، پەنجەکانی بە ئەنگوچکی کراسەکەوە بەستنەوە، دەمێك بـەرزی دەکـردەوەو دەمێك نزمی دەکردەوە، خەڵك هاتبووتە دەورەی‌و بە کوڵ دەگریـان‌و یـەکتریان هـان دەدا تۆڵەی بسێننەوە.[١] (شـورەحبیلی کـوڕی سـەمطـی کینـدی) بـە (معاویـە)ی وت: (عوسمـان) خەلیفەی ئێمە بوو، ئەگەر دەتوانی هەقی بسێنیەوە باشە، دەنا دەستبەردارت دەبین.[٢]

پیاوانی شـام سـوێندیان خـوارد هـەتا بکـوژانی عوسمـان‌و ئەوانـەش بـەرەو ڕوویـان دێـن نەکوژنـەوە یـان گیـانی خۆیـان لـەم پێنـاوەدا لـە دەسـت نـەدەن، سـەرجێی لەگـەڵ هاوسـەرەکانیان ناکـەن،[٣] معاویـەش ئەمـەی دەویـست، (نوعمـانی کـوڕی بەشـیر) وێنـەی بارودۆخەکەی بە شێوەیەکی سامناك بۆ دانیشتوانی شـام دەگواسـتەوە: (کـوژرانی خەلیفـە، ئاشوبگێڕان شمشێرەکانیان لەسەر گەردنی دانیشتوانی مەدینە داناوە، بەیتولماڵـە فـەرهودو تـالان کـراوە، پەنجـەکانی (نائیلـە) بـڕدراون)، دەرەنجـام خـەڵك کوڵیـان هەسـتاو هەسـت‌و نەستیان جوڵاو دڵ‌و دەروونیان خرۆشاو چاوەکانیان بە خوڕەزم فرمێسکیان باراند.

لەبەر ئەمە معاویەو خەڵکی شامی لایەنگری داکۆکیان لە تۆڵە سەندنەوەی تۆڵەی خوێنی عوسمان دەکردەوەو دەیانوت دەبێت پێش بەیعەتدانمان بە (عەلی) بکوژانی (عوسمـان)مـان بە مەبەستی تۆڵە لێسەندنەوە ڕادەست بکـەن. ئایـا دێتـە خـەیاڵ‌و بیروزەینـەوە، کـوژرانی ئـەمیری ئیمانـداران‌و سـەرداری موسـڵمانان لـە لایـەن ژمارەیـەك داخلـەدڵی تەڵەکـەبازی پیلانگێڕەوە ئەنجامدرابێت‌و جیهانی ئیسلامی لەو سەریەوە بۆ ئەوسەری بۆ تۆڵە سـەندنەوە لە خاوەنانی ئەم تاوانە قێزەونە هیچ شەپۆلێکی نەدابێت‌و نەخرۆشابێت؟!.[٤]

**٢ـ هۆکارەکانی بەیعەتنەدانی (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت):**

معاویە (خودا لێی ڕازی بێت) لە سەردەمی (عومەرو عوسمان)دا (خودا لێیان ڕازی بێـت) والی شام بوو، کاتێك عەلی (خودا لێی ڕازی بێت) بوو بە خەلیفـە ویـستی لایبـات‌و (عبـدالله ی کوڕی عومەر) (خودا لێیان ڕازی بێت) لە جێی دانێت، (عبدالله ی کـوڕی عومـەر) بروبیـانووی هێنایەوە، (عەلی)ش (سەهلی کوڕی حونەیف)ی لە جیاتی ئەو بەڕێکرد، بەڵام هێشتا هەر لـە (وادي القرى) بوو و نەگەیشتبووە بەرزاییەکانی (شام) بە ڕێی خۆیـدا گەڕایـەوە، لەوێنـدەرێ

---

١ البداية والنهاية (٧/٥٣٩)، سندها ضعيف.

٢ الانساب (٤/٤١٨)، تاريخ الدعوة الاسلامية (ص: ٣٩٨).

٣ تاريخ الطبري (٥/٦٠٠).

٤ (معاوية) بن ابي سفيان، للغضبان (ص: ١٧٨، ١٣٨).

ئەسپسوارانی (معاویە) بە سەرکردایەتی (حەبیبی کوڕی موسلیمەی فەهری) پێشیان پێگرتبوو پێیان وتبوو: ئەگەر (عوسمان) تۆی ناردووە بەخێر بێی، ئەگەر کەسێکی تر تۆی ناردووە بە رێی خۆتدا بگەڕێوە،[١] ئیدی معاویەو خەڵکی شام خۆیان لە بەیعەتدان بواردو، پێیان وابوو دەبێ عەلی (خودا لێی ڕازی بێت) تۆڵە لە بکوژانی عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت) بکاتەوە ئەمجا ئەوان دەچنە ژێر باری بەیعەتدانەوە،[٢] وتیان: بەیعەت نادەین بە کەسێك قاتیلەکانی پەنا دابن،[٣] لەوەش دەترسان کە لە لایەن ئەو قاتیلانەوە (کە لە نێو سوپاکەی (عەلی)دا بوون)زەبرو زیانیان پێ بگەیەنرێت، بە ڕای خۆیان بەر لە تۆڵەسەندنەوە واجب نیە لەسەریان بەیعەت بە (عەلی) بدەن، خۆ ئەگەر ئەوان لەسەر ئەمە جەنگیان لەگەڵ بکرێت ئەوا بەستەم لێکراو دێنە هەژمار، وتیان: چونکە عوسمان بە یەکدەنگی موسڵمانان بە ستەملێکراوی کوژراوە، بکوژەکانیشی لە سوپاکەی (عەلی)دان، ئێستا ئەوان باڵادەستو زاڵن، ئەگەر بەیعەتمان پێدا ستەممان لێ دەکەن‌و خوێنی عوسمانیش بە هەدەر دەڕوات.

معاویە (خودا لێی ڕازی بێت) پێی وابوو ئەرکی سەرخستنی عوسمان‌و تۆڵەسەندنەوە لە بکوژەکانی لە ئەستۆی خۆیدایە، چونکە ئەو (وەلی)یەتی‌و خوێنگرو خوێن ئەستێنیەتی، خودا دەفەرموێت: ﴿وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلْطَٰنًا فَلَا يُسْرِف فِّى ٱلْقَتْلِ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورًا﴾[٤] واتە: (هەر کەسێك بە ستەم بکوژرێت، ئەوا دەسەڵاتی تۆڵە سەندنەوە یان لێبوردنمان داوەتە دەست واریسەکەی، جا با لە کوشتنەوەکەدا زێدەڕۆیی نەکات. چونکە ئەو بە بڕیاری خودا لە لایەن حوکومەتی ئیسلامەوە سەرخراوە)، لەبەر ئەمە (معاویە) خەڵکی کۆکردەوەو سەبارەت بە عوسمان وتاری بۆ خوێندنەوە کە ئەو: بە دەستی ژمارەیەك موونافیقی کەودەن بە ستەم کوژراوەو ئەوان ڕێزیان لە خوێنی حەرام نەگرتووە لە مانگی حەرام‌و وڵاتی حەرامدا ڕشتوویانە.

ئیتر خەڵك هارۆژان‌و ناڕەزاییان دەربڕی‌و دەنگەدەنگ بەرز بۆوە، ژمارەیەك هاوەڵی پێغەمبەری خودا (ﷺ)یان تێدا بوون.

---

١ تاريخ الطبري (٥/٤٦٦).

٢ البداية والنهاية (٧/١٢٩).

٣ العواصم من القواصم (ص: ١٦٢).

٤ الاسراء (٣٣).

یەکێك لەنێو خەڵکەکەدا کە ناوی (موڕڕەی کوڕی کەعب) بوو هەستایە سەرپێ‌و وتی: ئەگەر ئەم فەرموودەیەم لە پێغەمبەری خودا (ﷺ)وە نەبیستایە قسەم نەدەکرد: ..... ئەمجا پێغەمبەری خودا (ﷺ) باسی ئاشووب‌و نزیکبوونەوەی کرد، پیاوێك کە خۆی دەمامك کردبوو تێپەڕی، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((هذا یومئذٍ علی الهدی)) واتە: ئەو ڕۆژە ئەم پیاوە لەسەر هەق‌و هودایە، هەستام بۆ لای پیاوەکە چووم تەماشام کرد (عوسمانی کوڕی عەففان)ە، ڕووی عوسمانم بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) سوڕاندو وتم: ئەوە؟ فەرمووی: ((نعم))[1] بەڵێ. لەو دەمەدا فەرموودەیەکی تریش کاریگەری زۆری خستە سەر دڵی (معاویە) تا داوای تۆڵەی کوشتنەوە لە بکوژانی عوسمان بکات‌و هێزو گوڕو تین‌و تەوژمێکی زۆری پێدا تا لە پێناوی بەدیهێنانی ئامانجەکانیدا پێداگیری بکات، ئەمەش فەرموودەکەیە: لە (نوعمانی کوڕی بەشیر)ەوە وتی: عائیشە (خودا لێی ڕازی بێت) وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) بە دوای (عوسمان)یدا نارد.... کۆتا قسەی کە پێی فەرموو: دەستێکی لە شانی داو (٣) جار لەسەر یەك پێی فەرموو: ((یا عثمان إن الله عز وجل عسى أن یُلبسك قمیصاً، فإن ارادك المنافقون علی خلعه فلا تخلعه حتی تلقاني)) واتە: ئەی عوسمان خەریکە خودای باڵادەست‌و مەزن کراسێکت لەبەر بکات، ئەگەر مونافیقەکان داوایان لێکردی دایکەنی تا بە من دەگەی دای مەکەنە. پێم وت: ئەی دایکی ئیمانداران تا ئێستا ئەو فەرموودەت لە کوێ دانابوو؟ وتی: بە خوا فەرامۆشم کریدووو لەبیرم نەدەهاتەوە. نوعمان وتی: منیش فەرموودەکەم بە (معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان) ڕاگەیاند، نامەی بۆ دایکی ئیمانداران نووسی‌و پێی وت کە ئەگەر شتێکی لەو جۆرە هەیە بۆی بنووسێتەوەو بۆی بنێرێت، ئەویش نامەیەکی بۆ نووسی، ئیدی تا نامەکەی (عائیشە)ی پێ نەگەیشت بە هەواڵەکەی من قایل نەبوو.[2]

سووربوون لەسەر جێبەجێکردنی حوکمی خودا لە بەرانبەر بکوژانی عوسمان، هۆکاری سەرەکی ڕەتکردنەوەی بەیعەتدان بە (عەلی کوڕی ئەبوتالیب) (خودا لێی ڕازی بێت) بوو لە لایەن خەڵکی شامەوە کە (معاویە) سەرکردایەتی دەکردن، پێیان وابوو دەبێت جێبەجێکردنی حوکمی تۆڵە بخرێتە پێش بەیعەتدانەوە، ئەمە لەبەر ئەوە نەبوو کە (معاویە) تەماعی لە ویلایەتی (شام)دا هەبووبێت چ جای ئەوەی کە داوای پۆستی (خیلافەت)یشی کردبێت، نەخێر، چونکە ئەو بە تەواوەتی لەوە گەیشتبوو کە پۆستی (خیلافەت) لە ڕستەی

---

١ صحیح سنن إبن ماجه (١/٢٤٠).

٢ مسند أحمد (رقم: ٢٤٠٤٥) حدیث صحیح.

ئەش كەسەكەی دەستەی ڕاوێژكار دەرناچێتو (عەلی)یش لە ئەو پایەدارترەو بۆ ئەم پۆستە شایانترە.[١]

لە (ئەبو موسلیمی خەولانی)یەوە، بە (معاویە)ی وت: تۆ كێبەركێی (عەلی) دەكەی، یان خۆت وەك ئەو حیساب دەكەی؟

وتی: نە بە خوا، من چاك دەزانم كە ئەو لە من چاكترەو بۆ حوكمڕانی شایستەترە، بەڵام ئێوە نەتانزانیوە كە (عوسمان) بە غەدر كوژراوەو منیش ئامۆزاو خوێنستێنی ئەم؟!، بچن بۆ لای ئەمەی پێ بڵێن، با بكوژەكانی (عوسمان)م ڕادەست بكات، منیش بۆی دەسەلمێنمو بەیعەتی پێ دەدەم، ئەوانیش هاتنە لای (عەلی)و قسەكە(ی معاویە)یان بۆ كرد، بەڵام ئەو بكوژەكانی پێ نەدان.[٢]

بەڵام سەبارەت بەو پڕوپاگەندەیەی لە كۆنو تازەداو لەنێو خەڵكدا بڵاوبووەتەوە كە گوایە: هۆكاری ناكۆكی نێوان (عەلیو معاویە) (خودا لێیان ڕازی بێت) ئەمەیە كە (معاویە) چاوی لە پۆستی خیلافەت بڕیبوو، هۆی لە فەرماندەرچوونەكەشی دەگەڕێتەوە بۆ لێخرانی لە پۆستی ویلایەتی شام ــلە لایەن (عەلی)یەوەــ، بێگومان ئەم ڕیوایەتانە ناڕاستو نەچەسپاون.

لە كتێبی (الإمامة والسياسة)ی (إبن قتيبة الدّينوري)دا ڕیوایەتێكی لەم چەشنە هاتووە، بەو حوكمە نووسەری كتێبەكە هەوای ڕافیزەگەرایی لە كەللەدا بە ڕیوایەتەكە ناڕاستو قەڵبە، لەمیانەی ڕیوایەتەكەدا دەڵێت: معاویە بانگەشەی خیلافەتی دەكرد، هەر لەنێو ئەو ڕیوایەتەدا گوایە (إبن الكواء) بە (أبو موسى الاشعري)ی (خودا لێی ڕازی بێت) وتووە: بزانە (معاویە) ڕەهاكراو ی ئیسلامە،باوكیشی سەرۆكی تاقمە هێرشبەرەكانی سەر (مەدینە)یە، ئەو بەبێ پرسوڕا بانگەشەی خیلافەت بۆ خۆی دەكات، ئەگەر ئەمەت پێ گوت(واتە ئەمەت بۆ عەمروی كوڕی عاص خستە ڕوو و) وتی وایە ئەوا لێخستنی(معاویە) حەڵاڵ دەبێت، ئەگەر ڕەتی كردەوە ئەوا حەڕامە قسەی لەگەڵ بكەی.[٣]

بێگومان ئەم قسەیە لە دەمی (عەلی)ی ئەمیری ئیماندارانەوە دەرنەچووە، بەڵكو قسەیەكی هەڵبەستراوی شیعە ڕافیزەكانە، بە ئیزنی خودا لەمەولاو لە شوێنی خۆیدا قسە

---

١ خلافة علي بن أبي طالب، لعبد الحميد (ص: ١١٢).

٢ سير أعلام النبلاء (٣/١٤٠)، رجاله ثقات وإسناده جيد.

٣ الإمامة والسياسة (١/١١٣).

لەسەر کتێبی (الإمامة والسياسة) دەکەین‌و درۆودەلەسەکانی‌و ڕۆڵە خراپەکانی لە شێواندنی ڕاستیەکانی مێژوودا ڕووندەکەینەوە.

کتێبەکانی مێژووو ئەدەب بەم تەرزە ڕیوایەتە هەڵبەستراوو لاوازانە ئاخنراون، کە وا دەگەیەنن: (معاویە) لە پێناوی دەسەلات‌و حوکومەت بەریەرەکانێی (عەلی) کردووە.[1]

ئەوەی ساغ بوویێتەوە: ناکۆکی‌و ناتەبایی نێوان (عەلی‌و معاویە) (خودا لێیان ڕازی بێت) لەسەر واجب بوون‌و واجب نەبوونی بەیعەتدانی (معاویەو هاوەڵانی) بووە بە (عەلی) لە پێش یان پاش تۆڵە سەندنەوە لە بکوژانی (عوسمان)، تۆزقاڵێك پەیوەندی بە بابەتی (خیلافەت)ەوە نەبووە، (معاویە)و (خەڵکی شام)ی پشتیوانی، پێیان وابوو دەبێ پێشدا (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) تۆڵە لە بکوژانی (عوسمان) بکاتەوە، ئەمجا ئەوان دەچنە ژێر باری بەیعەتدانەوە.[2]

(قازی إبن العربي) دەڵێت: جەنگی نێوان خەڵکی عێراق‌و خەڵکی شام بە هۆکاری جیاوازی ڕاو هەڵوێستی نێوانیان ڕوویدا، ئەمانە (واتە خەڵکی عێراق) بانگەشەیان دەکرد بۆ بەیعەتدان بە (عەلی)و یەکخستنی بڕیار، ئەوانەش (واتە خەڵکی شام) داوای گرتن‌و تۆڵە سەندنەوە لە بکوژانی (عوسمان)یان دەکردو دەیانگوت: بەیعەت بە کەسێك نادەین قاتیلەکانی پەنا داین.[3]

(إمام الحرمين) لە کتێبی (لمع الأدلة)دا دەڵێت: هەرچەندە (معاویە) شەڕی لەگەڵ عەلی دەکرد، بەلام قەت لاموجیمی لەسەر ئیمامەتیەکەی نەدەکردو ئەمەی بۆ خۆی داوا نەدەکرد، بەڵکو تەنها داوای بکوژەکانی (عوسمان)ی دەکرد، پێی وابوو لەم ئیجتیهادەیدا پێکاویەتی، بەلام هەڵە بوو.[4]

(الهيثمي) دەڵێت: بیروباوەڕی ئەهلی (سوننەت‌و جەماعەت) سەبارەت بەو جەنگانەی لە نێوان (معاویەو عەلی) (خودا لێیان ڕازی بێت)دا ڕوویداوە ئەوەیە:

(معاویە) لەسەر پۆستی خیلافەت کێبەرکێی (عەلی) نەکردووە، چونکە بە یەکدەنگ (إجماع) عەلی بە شایستەی ئەمە دانرابوو، فیتنەو ئاشوبەکە لەسەر ئەمە بەرپا نەبوو، بەڵکو

---

١ تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة (٢/١٤٥).

٢ البداية والنهاية (٨/١٢٩)، فتح الباري (١٣/٩٢).

٣ العواصم من القواصم (ص: ١٦٢).

٤ لمع الأدلة في عقائد أهل السنة والجماعة (ص: ١١٥).

لەسەر ئەوە (معاویە) خۆی بە ئامۆزاو خوێنگری عوسمان دەزانی، بەڵام عەلی لە بەردەم داواکەیدا ڕێگر بوو.[١]

ریوایەتەکان یەکتر بەهێز دەکەن‌و ئاماژە دەدەن کە: (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) هەڵوێستی خۆی لە مەڕ داخوازی تۆڵە سەندنەوەی خوێنی عوسمان نواندووەو بە ڕاشکاوی ڕایگەیاندووە هەر کات سزای تۆڵە لە بەرانبەر بکوشانی عوسماندا جێبەجێ کرا ئەوا ئەو ئامادەیە بچێتە ژێر باری فەرمانبەرداری عەلی (خودا لێی ڕازی بێت)، با بڵێین گریمان معاویە بابەتی (تۆڵەسەندنەوەی عوسمان)ی کردبێتە بەهانەی جەنگکردن لەگەڵ عەلی‌و چاوبڕینە پۆستی دەسەڵات، باشە ئەگەر عەلی حەددی لە بکوژەکانی عوسمان دەربکردایە، پاش ئەمە چ شتێك ڕووی دەدا؟ حەتمەن دەبووایە (معاویە) گەردنکەچ بووایەو بەیعەتی دابایە بە (عەلی)، چونکە ئەو لەم ئاشوبەدا خۆی پابەندی ئەم مەرجە کردبوو، هەموو لایەنگرەکانیشی لەسەر بنەمای مەرجی جێبەجێکردنی حوکمی سزای تۆڵە لە بەرانبەر بکوژەکانی عوسماندا هاتبوونە نێو جەنگەوە، خۆ ئەگەر (معاویە) جگە لەم مەرجە شتێکی تری لە دڵی خۆی گرتبێت ئەوا ئاشکرای نەکردووە، ئیدی لەمەولا هەڵوێستەکە دەگۆڕا بۆ جەنگی مان‌و نەمان‌و ئەگەر لە میانەی ئەوەشدا تەمایەکی تری هەبووایە نەدەکرا هەنگاوی بۆ هەڵێنێت.[٢]

معاویە (خودا لێی ڕازی بێت) یەکێك بوو لە کاتبەکانی (وەحی)و هاوەڵە پێشەنگەکان‌و لە ڕووی ئاوەز بارقوڵیەوە لە زۆربەیان کامڵتر بوو، جا کەواتە کەسێك ئەمە سیفاتی بێت، چۆن باوەڕ بەوە دەکرێت لە پێناو دنیای لەنێوچوودا شەڕ بە (خەلیفەی شەرعی) بفرۆشێت‌و خوێنی موسڵمانان بڕێژێت؟! کە ئەو بۆ خۆی وتوویەتی: سوێند بە خوا لە نێوان خوداو غەیری خودادا جگە لە خودا یەك شتی تر هەڵنابژێرم.[٣]

خۆ لە پێغەمبەری خودا (ﷺ)ەوە چەسپاوە کە دەربارەی فەرموویەتی: ((أللهم اجعله هادياً مهدياً واهدِ به))[٤] واتە: خودایە بیکەی بە ڕێنومای خێر، خودایە ڕێنمایی بکەی‌و خەڵکی پێ ڕێنمایی بکەی. هەروەها دەرهەقی فەرمووە: ((اللهم عَلّمه الكتاب وقه العذاب))[٥] واتە:

---

١ الصواعق المحرقة (٦٢٢/٢)، ئەمە ئیجتیهادی (معاویە) بوو، بەڵام وا چاك بوو (معاویە) بەیعەت بداتو ئەمجا داوای تۆڵە بکات.

٢ تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة (١٥٠/٢).

٣ سير أعلام النبلاء (١٥١/٣).

٤ صحيح سنن الترمذي للألباني، (رقم: ٣٠١٨)، (٢٣٦/٢).

٥ فضائل الصحابة (٣١٩/٢) إسناده حسن.

خودایە فێری قورئانی بکەیتو لە سزای بیارێزیت. هەڵەی (معاویە) خۆی لە ڕەتکردنەوەی بەیعەتدان بە عەلی (خودا لێی ڕازی بێت) پێش جێبەجێکردنی حوکمی تۆڵە بەسەر بکوژانی (عوسمان)دا خستەڕوو، زیاد لەمەش بە هۆی هەڵوێستە پێشینەکانی لە بەرانبەر ئاشوبگێڕەکاندا نواندبوونی وای لێکردبوو سڵ بکاتەوەو کەمێك ترسی لە خۆی هەبێت، بۆیە سووربوو لەسەر کوشتنەوەی بکوژەکان، بەڵکو داوای لە عەلی دەکرد بیانگرێتو ڕادەستی ئەویان بکات، بێگومان واریسی کوژراو بۆی نیە بۆ خۆی حوکم بدات، بەڵکو دەبێت بچێتە ژێر فەرمانەوەو ئەمجا داواکەی بۆ (حاکم) بەرز بکاتەوەو هەقی خۆی لە ڕێی ئەوەوە بسێنێتەوە.[1]

ئیمامانی (فتوا) لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون: کە بۆ کەس جائیز نیە بەبێ سوڵتان یان ئەو کەسەی سوڵتان بۆ ئەم کارەی داناوە، تۆڵە لە کەسێکی تر بکاتەوەو هەقی لێ بسێنێتەوە، چونکە ئەمە سەر بۆ ئاشوبو بڵاوبوونەوەی پشێوی دەکێشێت.[2]

دەکرێ بڵێین: (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) ئیجتیهادی کردو پێی وابوو هەق بە ئەوە، خەڵکی (شام)ی کۆکردەوەو وتاری بۆ خوێندنەوەو ئەوەی بەبیرهێنانەوە کە ئەو واریسی عوسمانی بە ناحەقکوژراوی ئامۆزایەتیو ئەم ئایەتەی بۆ خوێندنەوە: ﴿ وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۗ وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلْطَٰنًا فَلَا يُسْرِف فِّى ٱلْقَتْلِ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورًا ﴿٣٣﴾ ﴾[3]. ئەمجا وتی: حەز دەکەم هەڵوێستی خۆتانم سەبارەت بە کوژرانی عوسمان پێ بڵێن: هەموو خەڵکەکە هەستانو وەڵامیان دایەوە کە هەڵوێستیان داواکردنی سەندنەوەی خوێنی (عوسمان)ە، لەسەر ئەمە بەیعەتیان پێداو پەیمانیان لەم ڕێیەدا گیانو ماڵی خۆیان بەخت بکەن، جا یان تۆڵە دەسێنن، یان خودا گیانیان لێ دەستێنێتەوە.[4]

ئەگەر بەراوردێك لە نێوان (طلحة وزوبێر) لە لایەکەوەو معاویەو لایەنگرانی لە لایەکەی ترەوە بکەین دەبینین ئەوان لە چوار ڕووەوە لە هەقەوە نزیکترن:

یەکەم: هەردووکیان بەیعەتیان بە عەلی داوەو دانیان بە چاکەیدا هێناوە، بەڵام (معاویە) هەرچەندە دانی بە چاکەو مەزنایەتی (عەلی)دا داناوە، بەڵام بەیعەتی پێ نەدا.[5]

---

١ تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة (١٥١/٢).

٢ تفسير القرطبي (٢٥٦/٢).

٣ الاسراء (٣٣).

٤ صفين لإبن مزاحم (ص: ٣٢)، تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة (١٥٢/٢).

٥ البداية والنهاية (١٢٩/٨)، فتح الباري (٩٢/١٣).

دووەم: لە ڕووی پایەبەرزی‌و سابیقەوە (طلحة وزوبێر) پێش (معاویە)یان داوەتەوە.[١]

سێیەم: ئەوان لە جەنگی (جمل)دا بەس بە ئامانجی کوشتاری ئەوانەی لە دژی عوسمان دەرچوبوون بەشداریان کرد، نەك جەنگکردن لەگەڵ عەلی‌و خەڵکی گەلی.[٢]

بەڵام (معاویە) لە (صفین) بە مەبەستی ئەنجامدانی جەنگ لەگەڵ عەلی چووە نێو گۆڕەپانەوە.[٣]

چوارەم: ئەم دووانە (عەلی)یان بە کەمتەرخەم تاوانبار نەکرد لە بەرانبەر سەندنەوەی تۆڵەی عوسماندا، بەڵاك معاویەو لایەنگرانی (عەلی)یان بەمە تاوانبار دەکرد.[٤]

ئێمەش ئەم خاڵی پێنجەی دەخەینە سەر: کاتێك (طلحة وزوبێر) لەگەڵ (قەعقاعی کوڕی عومەر) ڕێککەوتن دڵیان ئاوی خواردەوە کە (عەلی) لەسەر هەقەو چوونە ژێر فەرمانی ئەوەوە، ئیدی هەڵایسانی جەنگەکە بە فیتو فووی سەبەئیە ئاژاوەگێڕەکان بوو.

**٣ــ (معاویە) وەڵامی (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران دەداتەوە:**

(عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) نامەی زۆری بۆ (معاویە) ناردن، بەڵام (معاویە) وەڵامی یەك نامەشی نەدایەوە، ئیدی ئەم نامە ناردنە تا مانگی (صفر)و بۆ ماوەی (٣) مانگ دوای کوژرانی عوسمان درێژەیان کێشا، ئەمجا (معاویە) نامەیەکی درێژی بە پیاوێکدا بۆ عەلی نارد، (عەلی) بە کابرای وت: چ شتێك بە دوای تۆدا بەڕێوەیە؟ وتی: لە لای خەڵکێکەوە هاتوومەتە لات جگە لە تۆڵەی کوشتنەوە چی تر داوا ناکەن، هەر هەموویان لەسەر ئەمە یەکدەنگن، کە هاتم (٦) هەزار پیر لە ژێر کراسەکەی عوسماندا کە لەسەر مینبەری مزگەوتی دیمەشق هەڵواسراوە دەگریان، (عەلی) وتی: خودایە پاکانەی خۆم دەرهەق بە ڕژانی خوێنی (عوسمان) بۆ زاتی پاکت ڕادەگەیەنم، ئەمجا نێردراوەکەی (معاویە) عەلی بەجێهێشت، ئەو تاقمەی (عوسمان)یان کوشتبوو هەوڵیاندا بیکوژن، بەڵام دوای هەوڵێکی زۆر ڕزگاری بوو.[٥]

**٤ــ سازکردنی سوپا بۆ جەنگی شام لە لایەن ئەمیری ئیماندارانەوە:**

دوای گەیشتنی بەرپەرچنامەکەی (معاویە) بۆ (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران، خەلیفە بڕیاری خۆی بۆ جەنگی خەڵکی شام ساغ کردەوە، نامەی بۆ هەر یەك لە: (قەیسی کوڕی

---

١ (طلحة و زوبێر) لە ڕیزی دە موژدە پێدراوەکانن.

٢ تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة (١١٣/٢)، تاريخ الطبري (٤٧٥/٥).

٣ تاريخ الطبري (٦١٢/٥ـ٦١٥).

٤ البداية والنهاية (٢٥٩/٧).

٥ البداية والنهاية (٢٤٠/٧).

سـەعد)ی والی (مـصر)و (ئـەبو موسـای ئەشـعەری)ی والی (کوفـە)و (عوسمـانی کـوڕی حونەیف)ی والی (بەصرە) ناردو داوای لێکردن سوپا بۆ جەنگی شام ساز بکەن، وتـاری بـۆ خەڵك خوێندەوەو هانیدان، سوپای ساز کـردو بڕیـاری دا لـە (مەدینـە) دەربـچێت‌و (قـەثمی کـوڕی عـەباس)ی بەسـەرەوە دانـا، ئیـدی بـە تـەواوەتی عـەزمی جـەزم کـرد فەرمانبـەرداری گوێڕایەڵەکانی خۆی چەکدار بکات‌و کوشـتاری سەرپێـچیکاران‌و لـە ژێرفـەرمان دەرچـووانی‌و هەموو ئەو کەسانەیان پێ بکات کە تا ئێستا دەستی بەیعەتیان پێ نەداوە، حوسێنی کـوڕی (خودا لێیان ڕازی بێت) هات‌و پێی وت: بابی خۆم! ئەم بڕیارەت ڕژانی خـوێنی موسـڵمانان‌و زیادبوونی ناتەبایی‌و ناکۆکی نێوان ئەوانی تێدایە، کەواتە وازی لێ بێنە!. بـەڵام لێـی قـەبوڵ نەکردو بەڵکو بڕیاری دا جەنگ بکات‌و سوپای ڕێکخست، ئاڵاکەی دایە دەست (محمدی کوڕی حونەیف)و (عبدالله ی کوڕی عەباس)ی بەسەر قۆڵی دەستەڕاستەوە داناو (عومـەری کـوڕی ئەبی سەلەمە)ی بەسەر قۆڵی دەستە چەپەوە دانا، دەشڵێن (عەمروی کوڕی سوفیانی کوڕی عبدالاسد)ی بەسەرەوە داناوە، (ئەبو لەیلای کوڕی عەمروی کوڕی جـەڕڕاح)ی بـرازای (ئـەبو عوبەیدە)ی بەسەر پێشەنگی سوپاکەوە دانا، ئیدی جگە لە دەرچوون لە مەدینەو پێشڕەوی کردن بـەرەو شـام هـیچ کـاری تـری نـەمان ئـەنجامیان بـدات، لـەم ئـان‌و ساتەدا هـەواڵێکی پێگەیـشت‌وڕێڕەوی سـوپاکەی پـێ گـۆڕی.[1] ئەمـە بـە دوورو درێـژی لـە کتێبـی (سـيرة أمـير المؤمنين علي بن أبي طالب)داو لە باسی دەرچوونی (عائیشەو تەڵحـەو زوبێـر) (خـودا لێیـان ڕازی بێت) بەرەو (بەصرە)و ڕووداوی جەنگی (جەمەل)دا قسەی لەسەر کراوە.[2]

**٥ـ دوابەدوای جەنگی (جەمەل)، (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران (خـودا لێـی ڕازی بێـت) (جەریری کوڕی عبدالله) بۆ لای (معاویە) دەنێرێت:**

وتراوە: ماوەی نێوان خیلافەتی (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران‌و ئاشوبی (سـەبەئی دووەم)، یان (جەنگی جەمەل) پێنج مانگ‌و بیست‌و یەك ڕۆژ بووە، نێوانی (جەنگی جەمـەل)و چـوونە (کوفە) مانگێك بووە، نێـوانی چـوونە (کوفـە)و چـوون بـەرەو (صـفين) شـەش مـانگ بـوو،[3] بەپێی ڕیوایەتی تر دوو مانگ یان سێ مانگ بووە.[4]

---

١ البداية والنهاية (٧/٢٤٠، ٢٤١).

٢ علي بن أبي طالب، للصلابي (١/٤٩٨ـ٦٢٤).

٣ مروج الذهب (٢/٣٦٠).

٤ التاريخ الصغير للبخاري (١/١٠٢).

ڕۆژی ٢ شەممەی ١٢ی ڕەجەبی ٣٦ی کۆچی (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران هاتە شاری کوفەوە، پێی وترا: لە باڵەخانەی سپی دانیشە، وتی: نا، (عومەری کوڕی خەتتاب) حەزی لێ نەبوو تێیدا دانیشێت، هەر لەبەر ئەمە منیش پێم ناخۆشە، ئەمەو لە (ڕەحبە) دابەزیو لە مزگەوتی گەورە دوو ڕکات نوێژی کردو ئەمجا هەستاو وتارێکی بۆ خەڵك خوێندەوەو بەرەو ئەنجامدانی گوفتارو ڕەفتاری خێرو چاکە هانیدانو داوای لێ کردن خۆیان لە شەڕو ئاشوبو هەرا بپارێزن، ئەمجا مەتحی دانیشتوانی کوفەی کردو بە کردەوە چاکەکانی هەڵگوتن.

(جەریری کوڕی عبدالله) لە سەردەمی (عوسمان)ەوە والی (هەمەدان) بوو، (ئەشعەسی کوڕی قەیس)یش بە هەمان شێوە والی (ئازەربایجان) بوو، (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران نوێنەری بۆ لای هەردووکیان ناردو داوای لێکردن بەیعەت لە دانیشتوانی ناوچەکانی ژێر دەستیان وەربگرنو ئەمجا خۆیان بگەیەننە لای، ئەمانیش ئەمەیان ئەنجامدا، کاتێك عەلی ویستی بە مەبەستی داواکردنی بەیعەت نوێنەرێك بۆ لای (معاویە) بنێرێت، (جەریری کوڕی عبدالله ی بەجەلی) وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران، من دەچم بۆ لای، نێوانی منو ئەو خۆشە، من بەیعەتت بۆ لێ وەردەگرم. (ئەشتەر) وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران، ئەم مەنێرە، من دەترسم هەواداری ئەو بێت، (عەلی) وتی: وازی لێ بێنە، ئەمجا بە نامەیەکەوە بەرەو لای (معاویە)ی بەڕێکرد، لە نامەکەدا باسی کۆکبوونی کۆچەرانو یاریدەدەرانی کردبوو لەسەر بەیعەتەکەی، هەواڵی ڕووداوەکەی جەنگی (جەمەل)ی بۆ باسکردبوو، داوای لێکردبوو بێتە نێو ئەو بازنەوە کە خەڵك هاتووەنەتە نێویەوە، کاتێك (جەریر) گەیشتە لای معاویەو نامەکەی پێدا، (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) (عەمروی کوڕی عاص)و سەرانی دانیشتوانی شامی بانگ کردنو سەبارەت بەمە ڕاوێژی پێکردن، بەڵام ئەوان قایل نەبوونو وتیان: هەتا عەلی بکوژەکانی عوسمان نەکوژێتەوە، یان ڕادەستی ئەوانیان نەکات، ئەوا ئەوان بەیعەت نادەن، خۆ ئەگەر عەلی ئەمە نەکات، ئەوا جەنگی لەگەڵ دەکەنو تا یەك بە یەکی قاتیلەکان نەکوژێتەوە بەیعەتی پێ نادەن. (جەریر) گەڕایەوە لای (عەلی)و چیان وتبوو بۆی گێڕایەوە، (ئەشتەر) وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران نەموت (جەریر) مەنێرە؟! خۆ ئەگەر منت ناردبایە (معاویە) هەر دەرگایەکی کردبایەوە دام دەخستەوە، (جەریر) پێی وت: ئەگەر تۆ چوبایتایە لە تۆڵەی (عوسمان) دەیانکوشتیەوە.

ئەشتەر وتی: بە خوا ئەگەر منت بناردبایە وەڵامی معاویەم نەدەچووە مێشکەوەو پێش ڕاوبۆچوونەکانیم دەدایەوە، ئەگەر ئەمیری ئیمانداران بە قسەم بکات ئەوا تۆو هاوێنەکانت بەند دەکات، تا ئەو ڕۆژەی کاروباری ئەم ئوممەتە ڕێکوپێك دەبێت، (جەریر) بە تووڕەیی

هەستاو چوو لە (قەرقیسیا) نیشتەجێ بوو، نامەیەکی بۆ (معاویە) نوسیبوو هەواڵی ئەو قسانەی پێی وترابوون پێ ڕاگەیاندبوو، معاویەش نامەیەکی بۆ نووسیەوەو داوای لێکردبوو خۆی بگەیەنێتە لای ئەو.[1]

بەم شێوەیە (ئەشتەر) بوو بە هۆکاری دوورکەوتنەوەی (جەریری کوڕی عبداللە)ی هاوەڵ کە ئەو کاتە والی (قەرقیسیا)و دەوروبەری بووو یەکێك بوو لە سەرانی هۆزی (بەجیلە)، ئەمەو (ئەشتەر) ناچاری کرد لە ڕیزی (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران دەرچێت، ئەم هاوەڵە بەڕێزە (جەریری کوڕی عبداللە ی بەجەلی) دەڵێت: هەر کات پێغەمبەری خودا (ﷺ) منی دیتبایە، بە زەردەخەنەوە تەماشای دەکردم، هەروەها پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەرهەقی فەرمووە: ((يطلع عليكم من هذا الباب رجل من خير ذي يمن، على وجهه مسحة ملك))[2] واتە: ئێستا یەکێك لەم دەرگایەوە لێتان دەردەکەوێت، مرۆیەکی بەخێروبێرە، شوێنەواری دەستی فریشتەیەکی بەسەر ڕووەوەیە.

### ٦ـ بەڕێکەوتنی (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران بەرەو (شام):

(عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران خۆی بۆ جەنگی (شام) ساز کردو داوای لە خەڵك کرد خۆیان ئامادە بکەن، سوپایەکی گەورەی ڕێکخست، ڕیوایەتەکان کە هەر هەموویان لاواز (ضعيف)ن لەسەر ژمارەکەی جیاوازن،[3] جگە لە تاکە ڕیوایەتێك کە (حەسەن)ەو دەڵێت: (٥٠) پەنجا هەزار کەس بووە،[4] سوپاکەی ئەمیری ئیمانداران لە (نەخلە)[5] هەڵیدا، کە (٢) میل لە کوفەوە دوورە، ئیدی هۆزەکانی هەرێمەکانی (عێراق) هاتن بۆ لای،[6] (ئەبو مەسعودی ئەنصاری) کردە والی (کوفە)، (زیادی کوڕی نەزری حاریسی) کردە سەرکردەی (٨) هەزار جەنگاوەرو لە (نەخلە)وە بەڕێی کرد،(٤) هەزار جەنگاوەریشی بە سەرکردایەتی (شورەیحی کوڕی هانی) بەڕێکرد، ئەمجا (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) بە خۆی‌و سوپاکەیەوە بەرەو مەدائین (بەغدا) دەرچوو، جەنگاوەرەکانی ئەوێش پەیوەندیان بە سوپاکەیەوە کرد، (سەعدی کوڕی مەسعودی سەقەفی)ی بە سەرەوە دانا، سێ هەزار جەنگاوەری لەوێوە بەرەو (موصڵ)

---

١ البداية والنهاية (٧/٢٦٥).

٢ مسلم (رقم: ٢٤٧٥).

٣ أسمى المطالب في سيرة أمير المؤمنين علي بن أبي طالب (٢/٦٣٠).

٤ تاريخ خليفة (ص: ١٩٣) بسند حسن.

٥ (نەخلە) شوێنێکە لە نزیك (کوفە)و کەوتووەتە باری (شام)ەوە، معجم البلدان (٥/٢٧٨).

٦ خلافة علي بن أبي طالب لعبد الحميد (ص: ١٨٨).

بەڕێکرد،[١] (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) ڕێگەی سەرەکی (جزیرە)ی گرتەبەرو بە قەراغی ڕووباری فوراتی خۆرهەڵاتدا ڕۆیشت تا گەیشتە نزیکی (قەرقیسیا)،[٢] لەوێ هەواڵی بۆ هات، کە (معاویە) بۆی هاتووەتە دەرو لە (صەفین) سەربازگەی هەڵداوە، عەلی (خودا لێی ڕازی بێت) بەرەو (رقە)[٣] پێشڕەوی کرد، لەوێوە لە فورات پەڕیەوەو بەرەو خۆرئاوا ڕۆیشت‌و بەسەر (صەفین)ەوە هەڵیدا.[٤]

**٧ـ دەرچوونی (معاویە) بۆ (صەفین):**

معاویە (خودا لێی ڕازی بێت) پیاوانە دەستی بە وەدەرنانی بکوژانی عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت) کرد، ئەمەو توانی لە بۆسەیەکدا پێرێک لەو تاقمە ئاشوبگێڕەی لە (مصر)ەوە هاتبوونە سەر (مەدینە)، لە کاتی گەڕانەوەیاندا خافڵگیر بکات‌و بیانکوژێت، لەنێو ئەو کوژراوانەدا (أبو عمروی کوڕ بەدیلی خوزاعی)[٥] هەبوو، بێ لە ئەمە لە (مصر)یش خەڵکی بۆ دلنابوون، تاقمێك لە خەڵکی (خربتا)ی مصر ڕاپەڕیبوو داوای تۆڵەی خوێنی عوسمانی دەکردو، ساڵی (٣٦)ی کۆچی لە چەند ڕووبەڕووبوونەوەیەکدا توانی (محمدی کوڕی ئەبی حوزەیفە) شکستخواردوو بکات، بە هەمان شێوە (معاویە) پێش ئەوەی دەرچێت بۆ (صەفین) توانی سەرانی پیلاندانەری هێرشی ئاشوبگێڕە (مصر)یەکانی وەك: (عبدالرحمن ی کوڕی عەدیس‌و کینانەی کوڕی بیشرو محمدی کوڕی حوزەیفە) خافڵگیر بکات‌و لە (فەلەستین) بەندیان بکات‌و پاشانیش لە مانگی قوربانی ساڵی (٣٦)ی کۆچی بیانکوژێ.[٦]

کاتێك (معاویە) زانی سوپای (عێراق) بەرەو (صەفین) جوڵاوە، تەواوی ڕاوێژکارە شامییەکانی کۆکردنەوەو بەم شێوەیە وتاری بۆ دان: (عەلی) خەڵکی عێراقی بەسەر کردووین،......، (ذو الکلاع ی کوڕی حەمیری) وتی: ڕاو فەرمان هی تۆیەو ئێمەش ڕاپەڕاندنمان لەسەرە.[٧] پێشدا خەڵکی شام بۆ تۆڵە عوسمان بەیعەتیان بە (معاویە) دابوو

---

١ تاريخ الطبري (٦٠٣/٥)، بسند منقطع.

٢ (قرقیسیا) شارێکە لەسەر ڕووباری (خابور)و لەو شوێنەی لەگەڵ ڕووباری (فورات) تێکدەکاتەوە هەڵکەوتووە، معجم البلدان (٣٢٨/٤).

٣ (رقە) شارێکی بەناوبانگی (سوریا)ی ئێمڕۆیە، کەوتۆتە بەشی خۆرهەڵاتی (فورات)، معجم البلدان (١٥٣/٣).

٤ تاريخ الطبري (٦٠٤/٥).

٥ المحن لأبي العرب التميمي (ص: ١٢٤)، خلافة علي، لعبد الحميد (ص: ١٩١).

٦ خلافة علي، لعبد الحميد (ص: ١٩١).

٧ الإصابة (٤٨٠/١)، خلافة علي بن أبي طالب، لعبد الحميد (ص: ١٩٢).

خۆیان بۆ شەڕ سازكردبوو.[١] (عەمرۆی كوڕی عاص) دەستی بە سازكردنی سوپا كردو هەستایە سەرپێو لە وتارەكەیدا هانیدانو وتی: خەڵكی (عێراق) پەرتەوازە بوونو دەسەڵاتیان كز بووەو سواون، دانیشتوانی (بەصرە) ئەوانەی لە دژی (عەلی) هەڵگەڕابوونەوە، (عەلی) هەمووی كوشتنو دوابڕاوی كردن، سەرانی (بەصرە)و سەرانی (كوفە) لە ڕۆژی (جەمەل)دا بوونە سووتەمەنی جەنگ، ئێستا ئەو -واتە (عەلی)- لەگەڵ دەستەو تاقمەیەكی كەم هاتووەتە سەرتان، لەنێوانیاندا خەڵكانێك هەن (خەلیفە)ی ئێوەی كوشتووە، خوداتان بە گژدادەكەم هەقتان بە زایە بدەنو خوێنتان بە بەلاش بدەن.[٢]

ئیدی (معاویە) بە خۆیو سوپایەكی قەبارە زلەوە بەڕێكەوت، ڕیوایەتەكان، كە سەنەدی هەر هەموویان پچڕپچڕ (منقطع)ە، سەبارەت بە مەزەندەكردنی ژمارەكەیەوە لێكجیاوازنو هەمان ڕیوایەتن كە مەزندەی سوپاكەی (عەلی)یان كردووە، هەیانە بە سەدو بیست هەزار جەنگاوەری ژماردووە،[٣] هەشیانە بە (٧٠)هەزاری داناوەو ڕیوایەتیش هەیە كە بە زۆرتر لەم ژمارانەی داناوە، نزیكترین ڕیوایەت لە ڕاستیەوە دەڵێت: (٦٠) هەزار جەنگاوەر بووە، هەرچەندە ڕیوایەتەكە لە سەنەدەكەیدا پچڕان هەیە بەڵام ڕیوایەتكەرەكەی ناوی (صەفوانی كوڕی عەمروی سكسی)یەو خەڵكی (حمص)ی سەر بە (شام)ەو لە دایكبووی ساڵی (٧٢)ی كۆچیەو ڕاستگۆو متمانە پێكراوە، وەك لە توێژینەوەی ژیانیدا ڕوونكراوەتەوە خەڵكێكی زۆری ئامادەبووی جەنگی (صەفین)ی بینیووەو[٤] پاڵدانی ڕیوایەت بۆ لای ئەو بە (صحیح) دادەنرێت.[٥]

**سەركردەكانی سوپای (معاویە) بەم جۆرە بوون:**

(عەمروی كوڕی عاص) سەركردایەتی هەموو ئەسپسوارانی (شام) بوو، (زوحاكی كوڕی قەیس) سەركردەی سوپای پیادەی (شام) بوو، (ذو الكلاع الحميري) پێشەنگی هێزی دەستەڕاست بوو، (حەبیبی كوڕی موسلیمە) پێشەنگی هێزی دەستەچەپ بوو، (أبو الأعور السلمي) سەركردەی هێزی پێشڕەو (نێوەڕاست) بوو، ئەمانە سەركردە گەورەكان بوونو هەر یەكێكیش لەمان چەند سەركردەیەكی تری لەبەر دەستدا بوونو بەپێی هۆزەكان دابەش

١ أنساب الاشراف (٢/٥٢) بسند منقطع، خلافة علي، لعبد الحميد (ص: ١٩٢).
٢ تاريخ الطبري (٥/٦٠١) بسند منقطع.
٣ خلافة علي، لعبد الحميد (ص: ١٩٤)، المعرفة والتاريخ (٣/٣١٣).
٤ سير أعلام النبلاء (٦/٣٨٠).
٥ خلافة علي بن أبي طالب، لعبد الحميد (ص: ١٩٤).

بیوون، کاتێك بەرەو (صەفین) بەڕێکەوت ڕیزبەندیەکە بەم شێوازە بوو، بەڵام لە ماوەی جەنگەکەداو بەپێی داخوازی بارودۆخ ئاڵوگۆڕ بەسەر هەندێك لە سەرکردەکاندا هاتو چەند سەرکردەیەکی تر جێیان گرتنەوە، پێ دەچێت بەم هۆکارەوە بێت ناوی سەرکردەکان لە هەندێك سەرچاوەدا بە جیاوازی هاتووە.[1]

ئەمەو (معاویە) (ئەبا ئەعوەری سەلەمی) لە پێش سوپادا بەڕێکرد، ڕێڕەوی کاروانەکەیان بەرەو باکووری خۆرهەلاتی (دیمەشق) بوو، هەر کە گەیشتە (صەفین)ی بەر فورات، سەربازگەی لە شوێنێکی دەشتی بەرفراوانو سەر جۆگایەکی ڕووباری فورات هەڵدا، لەم شوێنەدا جگە لەو جۆگەئاوە هیچ سەرچاوەیەکی دەست نەدەکەوت، ئەویش دەستی بەسەردا گرت.[2]

### ٨ـ جەنگ لەسەر ئاو:

سوپای (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) (خودا لێی ڕازی بێت) گەیشتە (صەفین) بەڵام شوێنێکی فراوانو دەشتی دەست نەکەوت، بە ناچاری لە ناوچەیەکی بەردەڵانو خاکقەڵشیو بارگەی خست،[3] هەر ئەوەندەیان زانی (معاویە) ڕێی چوونە سەر ئاویان لێ دەگرێت، هەندێك سەرباز بە هەڵەداوان خۆیان گەیاندە عەلی (خودا لێی ڕازی بێت)و ئەمەیان پێ ڕاگەیاند، (عەلی)یش (ئەشعەسی کوڕی قەیس)ی بە دوو هەزار جەنگاوەرەوە ناردە سەریان، بەمە یەکەمین جەنگ لە نێوانیاندا ڕوویدا، دەرەنجام (ئەشعەث) سەرکەوتو دەستی بەسەر ئاوەکەدا گرت.[4]

بەڵام بەپێی ڕیوایەتێکی تر ئەسڵەن جەنگ لەسەر ئاو نەقەوماوەو دەڵێت: (ئەشعەثی کوڕی قەیس) هاتە لای معاویەو پێی وت: ئەی (معاویە) دەرهەق بە ئوممەتی (محمد) (ﷺ) خودات بەگژدا دەکەم، خودات بەگژدا دەکەم، خەبەردار بن! ئەگەر ئێوە خەڵکی عێراقتان (لە تینوان) کوشت، ئەی کێ بۆ خەڵکی ڕەشو ڕووتومندالوپال وەمێنێت؟ خودا دەفەرموێت: ﴿وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱقۡتَتَلُواْ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَا﴾[5] واتە: ئەگەر دوو تایەفە لە ڕیزی ئیمانداران جەنگیان کرد، هەوڵدەن ئاشتیان بکەنەوە.

---

١ إمتداد العرب في صدر الاسلام، صالح العلي، خلافة علي (ص: ١٩٤).
٢ صفين، لنصر بن مزاحم (ص: ١٦٠ـ١٦١).
٣ خلافة علي بن أبي طالب، لعبد الحميد (ص: ١٩٦).
٤ مصنف إبن أبي شيبة (١٥/٢٩٤) بسند حسن.
٥ الحجرات (٩).

معاویە وتی: جا چیت دەوێت؟ وتی: ڕێگەی بەردەم سەرچاوەكەمان بۆ چۆڵ بكەن، بە (ئەبی ئەعوەر)ی وت: نێوانی برایەكانمانو سەرچاوەكە چۆڵ بكە.[1] یەكەم ڕۆژی شەڕكردنیان لەسەر ئاو سەرەتای مانگی قوربان بووو بەمە قفڵی دەرگای شەڕەكە شكێنرا، سەرتاسەری ئەو مانگە قوڵەشەڕیان دەكردن، شەڕەكان لە نێوان مەفرەزەی بچووكی نێوانیاندا ئەنجام دەدران، مەفرەزەی هەر كامێكیان ئەمیرێكی بە سەرەوە دادەنراو لە شەوو ڕۆژێكدا جارێك یان دوو جار تێك دەگیران، بە زۆری ئەم كەسانە لە سوپاكەی (عەلی)یدا ئەمیرایەتی مەفرەزەكانیان دەكرد: (ئەشتەر، حیجری كوڕی عەدی، شبتی كوڕی ڕیبعی، خالیدی كوڕی موعتەر، مەعقەلی كوڕی یەساری ڕیاحی)، لەنێو سوپاكەی (معاویە)شدا بە زۆری ئەمانە دەردەچوون: (حەبیبی كوڕی موسلیمە، عبدالرحمن ی كوڕی خالیدی كوڕی وەلید، عوبەیدوڵڵای كوڕی عومەری كوڕی خەتتاب، ئەبو ئەعوەڕی ئەسلەمی، شورەحبیلی كوڕی سەمط).

ئەمەو لە ترسی یەكتر قڕكردنو بە ئومێدی صوڵحكردنێك كە گیانو خوێنی هەردولا دەپارێزێت خۆیان لە جەنگو پێكهەڵشاخانی گەورەو بەرفراوان پاراست.[2]

## ٩ـ ڕاگرتنی شەڕو هەوڵەكانی (صولح):

هێشتا مانگی (موحەڕڕەم) لە نوێ هەڵنەهاتبوو، هەردوولا بە نیازی ئەنجامدانی صوڵحێك كە خوێنی موسڵمانان لە ڕژان بپارێزێت دەستیان لە شەڕ هەڵگرتو حورمەتی ئەم مانگەیان بە هەل وەرگرتو نوێنەرانی هەردوولا دەستیان بە هاموشۆی یەكتر كرد، هەرچەندە ئەو ڕیوایەتانەی ئەمە باس دەكەن لە ڕێگەی لاواز (ضعیف)ەوە هاتوونو[3] بەڵام لاواز بوونیان ئەوە ناگەیەنێت، كە شتێكی لەم بابەتە لە نێوانیاندا ڕووی نەدابێت، ئەمیری ئیمانداران: (عەلی كوڕی ئەبو تالیب) (خودا لێی ڕازی بێت) دەستپێشخەری بوو، (بەشیری كوڕی عەمروی ئەنصاریو سەعیدی كوڕی قەیسی هەمەدانیو شبتی كوڕی ڕیبعی تەمیمی) بۆ لای (معاویە) ناردنو وەكو جارەكانی تر داوای لێكرد بێتە نێو جەماعەتو بەیعەتەوە، معاویەش هەمان وەڵامە زانراوەكەی جارەكانی تری بۆ ناردەوە، كە دەڵێت: ڕادەستكردنی بكوژەكانی

١ سير أعلام النبلاء (٤١/٢)، مرويات أبي مخنف (٢٩٦).

٢ خلافة علي، لعبد الحميد (ص: ١٩٧، ١٩٨)، تاريخ الطبري (٦١٤/٥)، البداية والنهاية (٢٦٦/٧).

٣ تاريخ الطبري (٦١٢،٦١٣/٥)، خلافة علي بن أبي طالب (ص: ١١٩).

عوسمان، یان سەرەتا کوشتنەوەیان، ئەمجا چوونە نێو بەیعەت دەست پێ دەکات، ئیدی هەڵوێستی (عەلی)یشمان سەبارەت بەمە زانیوە.[١]

قورئانلەبەرانی هەردولا کە ژمارەیان یەجگار زۆر بوو لە لایەکی (صەفین)ەوە تاوڵیان هەڵدا، چەندجار هەوڵیاندا ئاشتیان لەنێواندا بکەن، بەڵام هەر هەموو ئەو هەوڵانە بە هۆی پابەندبوونی هەر یەکێك لە دەستەی هەردولا بە ڕاو هەڵوێستی خۆیەوە سەریان نەگرت.[٢] هەردوو هاوەڵی پێغەمبەری خودا (ﷺ): (ئەبو دەرداو ئەبو ئومامە) (خودا لێیان ڕازی بێت) هەستان صولحیان لەنێواندا بکەن، ئیدی هەوڵەکەیان سەری نەگرت‌و ئەوانیش لە بەرانبەردا بەجێیان هێشت‌و ئامادە نەبوون چیدیکە بەشداریان بکەن.[٣]

هەروەها (مەسروقی کوڕی ئەجدەع)ی گەورە تابعی لەوێ ئامادە بووو بە خاتری پێکهێنانەوەی هەردوولا هەستایە سەرپاو وتاری بۆ خەڵك داو وتی: ئەی خەڵکینە بێ دەنگ بن، ئەمجا وتی: ئەگەر پێتان بڵێم ئێستا یەکێك لە ئاسمانەوە بانگتان دەکات، ئێوەش تەماشای بکەن، گوێتان لێ بێت کە پێتان بڵێ: (خودا ڕێگری ئەمەتان لێ دەکات)، ئایا بە قسەی دەکەن؟ وتیان: بەڵێ، وتی: دە بە خوا (جوبرائیل) لە ئاسمانەوە دابەزیوەو ئەمەی بە (محمد) (ﷺ) وتووە.... ئێستاش هەمیشە بەم بانگەوە دێ، ئەمجا ئایەتەکەی خوێندەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ ۚ وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴿٢٩﴾ ﴾[٤] واتە: هۆ ئەوانەی ئیمانتان هێناوە، سەروەت‌و سامانی یەکتر بە ناهەق مەخۆن، بەڵام لە ڕێی بازرگانیەکی شەرعی‌و بە ڕەزامەندی خۆتان قەیدی ناکات، خۆشتان مەکوژن، چونکە خودا بەرانبەرتان بە بەزەییە. ئەمجا شەقڵێکی بەنێو خەڵکەکەدا لێداو ڕۆیشت.[٥]

ئەمەو (إبن كثير) ڕەخنەی لەو درێژدادڕیانە گرتووە کە لە ڕیوایەتەکانی (أبي مخنف‌و نصری کوڕی موزاحیم)دا هەیە، بە تایبەتی سەبارەت بە هاموشۆی نوێنەران لە نێوان هەردوولاداو دەڵێت: .... ئەمجا مێژوونووسان قسەگەلێکی زۆریان نووسیوونەوە کە گوایە لە

---

١ تاريخ الطبري (٥/٦١٣)، خلافة علي (ص: ١٩٩)..

٢ المصدر نفسه (٥/٦١٤).

٣ البداية والنهاية (٧/٢٧٠).

٤ النساء (٢٩).

٥ الطبقات (٦/٧٨)، القراء دورهم في الحياة العامة في صدر الاسلام والخلافة الأموية: هادي حسين محمود.

نێوان ئەوان (واتە لایەنی معاویەو خەڵکی شام)و (عەلی)یدا کراون، سەبارەت بە ڕاستی قسەکانی هەردوولا تێبینی هەیە، گوایە (عەلی) لە ماوەی ئەم وتووێژانەدا (معاویە)و (باوکی) بە کەم داناونو وتبێتی: ئەوان هاتوونەتە نێو ئیسلامەوە، بەڵام ئێستاش دوو دڵن، یان گوایە سەبارەت بە عوسمان وتبێتی: من ناڵێم عوسمان بە ستەملێکراوی یان بە ستەمکاری کوژراوە، بە بیروڕای من ئەم قسانە لە (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) دەرنەچوونو ڕاست نین.[1]

بێگومان هەڵوێستی (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) لە بەرانبەر کوژرانی عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت) ڕوونو ئاشکرا بوو، من لە کتێبی (عوسمانی کوڕی عەففان)داو لەم کتێبەشدا دەرم خستووە.

## سێهەم: بەرپابوونی جەنگ:

پاش بە بنبەستگەیشتنی هەوڵەکانی ئاشتی، بارودۆخەکە وەکو مانگی (قوربان)ی لێهاتەوەو بۆ ماوەی یەك هەفتە قوڵەشەڕ لە نێوان کەتیبەو مەفرەزە بچووکەکاندا دەستی پێکرایەوە، تا ئەم کاتە زیاتر لە (٧٠) قوڵەشەڕیان ئەنجامدابوون، دەشوترێت: (٩٠) نەوەت کەرەت تێکگیرابوون.[2] بەڵام دوای ئەمە (عەلی) لە نێو سوپاکەیدا ڕایگەیاند کە بەیانی چوارشەممە هەموو سوپا دەباتە گۆڕەپانی جەنگەوە، ئەمجا ئەم هەواڵەی بۆ (معاویە)ش نارد.[3]

ئەو شەوە خەڵك بە خەبەر بوون دەستیان بە چاککردنی چەکەکانیانو دەمەزەردکردنەوەی شمشێرەکانیان کرد، (عەمروی کوڕی عاص) چوو چەكو شمشێری لە (مەخزەن) دەرهێنانو بەسەر ئەو کەسانەیدا دابەش کردن کە زۆریان پێویستی پێ بوون یان شمشێرەکانیان کول ببوون، لەگەڵ ئەمەدا گیانی ئازایەتی بەبەردا دەکردنو بۆ کوشتار هانی دەدان.[4]

---

١ البداية والنهاية (٧/٢٦٩).

٢ الأنباء بتواريخ الخلفاء (ص: ٥٩)، شذرات الذهب (١/٤٥).

٣ البداية والنهاية (٧/٢٧٣).

٤ سنن سعيد بن منصور (٢/٢٤٠) ضعيف.

ئەو شەوە سوپا بە ڕاوێژکردن‌و ڕێکخستنی سەرکردەکانی‌و لیواکانیەوە بەیانی کردەوە.[١]

١ـ ڕۆژی یەکەم:

بەرەبەیانی چوارشەممە هەردووك سوپا بە پێی پەیڕەوی دابەشبوونی جەنگی گەورەی ئەو دەمە: (نێوەڕاست، ڕاست، چەپ) خۆیان ڕێکخست‌و ریزیان بەست، سوپای عەلی (خودا لێی ڕازی بێت) بەم جۆرە بوو:[٢]

(عەلی کوڕی ئەبو تالیب) بەسەر قۆڵی ناوەڕاستەوە بوو، (عبدالله ی کوڕی عەبباس) بەسەر قۆڵی چەپەوە بوو، (عەمماری کوڕی یاسر) بەسەر هێزی پیادەڕەوەوە بوو، (محمدی کوڕی حەنەفییە)و (هوشامی کوڕی عوتبە–مەڕقال–) هەردووکیان ئاڵاهەڵگر بوون. (ئەشعەثی کوڕی قەیس) بەسەر قۆڵی ڕاستەوە بوو.

سوپای (شام)یش بەم چەشنە دابەش ببوو:

(معاویە) بەسەر کەتیبەی (شوهەبا)ی زرێپۆشەوە بوو، وەکو فەرماندەی گشتی سوپا لەسەر گردێکی بەرز قەراری گرتبوو، (عەمروی کوڕی عاص) سەرکردەی تەواوی ئەسپسوارانی (شام) بوو.

(ذو الكلاع الحميري) بەسەر قۆڵی ڕاستەوە بوو کە لە خەڵکی یەمەن پێکهاتبوو.

(حەبیبی کوڕی موسلیمەی فەهری) بەسەر قۆڵی چەپەوە بوو کە لە خەڵکانی هۆزی (موزەڕ) پێکهاتبوو.

(مەخاریقی صەباحی کولاعی)ی ئاڵاهەڵگر بوو.[٣]

هەردوو سوپا لە بەرانبەر یەك ڕاوەستان، لەبەر زۆری ژمارەی سەربازان کون‌و کەلێنەکان داخران، ئەمەو کاتێك (کەعبی کوڕی جعیلی تغلبی)[٤]ی شاعیری عەرەبزووبان خەڵکی لە شەوی چوارشەممەدا بینی‌و خەریکی تیروکەوان‌و شمشێرەکانیان‌و چاکیان دەکەنەوەو دەیانسون‌و خۆیان بۆ سبەینێ ساز دەکەن، وتی:

| | |
|---|---|
| أصبحت الأُمة في أمر عجب | والملك مجموع غداً لمن غلب |
| فقلت قولاً صادقاً غير كذب | إن غداً تهلك أعـــلام العرب[٥] |

---

١ علي بن أبي طالب للصلابي (٢/٦٢٥).

٢ تاريخ خليفة بن خياط (ص: ١٩٣)، بسند حسن الى شاهد عيان.

٣ المصدر نفسه (ص: ١٩٣).

٤ الأعلام للزركلي (٦/١٨٠).

٥ البداية والنهاية (٧/٢٧٣)، تاريخ الطبري (٥/٦٢٦).

بە گوێرەی چەند ڕیوایەتێکی لاواز (ضـعیف)، (علـی) وتـاری بـۆ سـوپاکەی داو هانیـدان خۆڕاگرو پیَ چەسپاوو هەڵمەت بـەر بـن‌و زۆریـش زیکـری خـودا بکـەن،[1] هـەروەها (عـەمروی کـوڕی عـاص) سـوپای (شـام)ی ڕانوانـدو فەرمانیـدا ڕیزەکانیـان ڕێـك بخـەن‌و بەسـەر پـاوە ڕابوەستن.[2]

ئیتر خۆڕێگرێك دەست ناکەوێت نەیەڵێت لـەم حاڵەتانـەدا شـتێکی لـەم جـۆرە ئـەنجام بـدرێت، چـونکە هـەر هـەموو سـەرکردەیەك هـەوڵ دەدات سـوپاکەی خـۆی هـان بـداتو بـۆ گۆڕەپانی جەنگ گەرمی بکاتو بایەخ بە هەموو ئەو شتانە بدات کە پێی سەردەکەوێت.

هەردوو سوپا لە جەنگێکی توندی دەستەویەخەدا پێکهەڵاشاخان، تـا خۆڕئـاوا درێـژەی کێشا، هەر کامێکیان لە کاتی نوێژەکاندا گۆڕەپانی جەنگی چۆڵ دەکـردو خـۆی دەگەیانـدە سەربازگەکەی‌و نوێژەکەی خۆی بەرپادەکرد، ئەمەو گۆڕەپانی جەنگ بـە لاشـەی کـوژراوانی هەردوولا داپۆشرابووو وەکو دیوار ببووە نێوانی هەردوو سەربازگەکە.

یەکێك لە جەنگاوەرانی نێو سوپای (عەلی) دوای بـەرپاکردنی نوێژەکـەی بـە عـەلی (خـودا لێی ڕازی بێت) وت: ئەی ئەمیری ئیمانداران: دەربارەی کوژراوەکانی خۆمـان‌و کوژراوەکـانی ئەوان چ دەڵێی؟ وتی: هـەر کەسـێك چ لـە ئێمـەو چ لـە ئـەوان ئامـانجی ڕەزامەنـدی خـوداو پاداشتی قیامەت بوویێتو کوژرابێت دەچێتە بەهەشت.[3]

زۆریان خۆڕاگرت لە بەرانبەر یەکتردا، بـەڵام کـەس بەسـەر کەسـدا زاڵ نـەبوو و کەسـیش نەبینرا ڕابکاتو هەڵبێت، دەمەوئێوارە عەلی (خـودا لێـی ڕازی بێـت) خـۆی بـەنێو گۆڕەپـانی جەنگدا کردو تەماشـایەکی خـەڵکی (شـام)ی کـردو بـەم شـێوازە لـە پـەروەردگار پاڕایـەوە: خودایە لەمەش‌و لەوانیش خۆش ببە.[4]

٢ـ ڕۆژی دووەم:

ڕیوایەتەکان باس لەوە دەکەن کە عەلی (خودا لێی ڕازی بێت) نوێژی بەیانی لە تاریکاییدا بەرپاکردو خۆی بۆ هێرشکردن ساز کردو ژمارەیەك سەرکردەی ئاڵوگۆڕ کـردن، (ئەشعەسـی کـوڕی کینـدی) لـە قـۆڵی ڕاسـتەوە بـۆ قـۆڵی چـەپ گواسـتەوەو (عبـدالله ی کـوڕی بـەدیلی خوزاعی) لە جێگە دانا.[5]

---

١ تاريخ الطبري (٥/٦٢٢)، من طريق أبي مخنف.

٢ الطبقات (٤/٢٥٥) من طريق الواقدي.

٣ سنن سعيد بن منصور (٢/٣٤٤) بسند ضعيف.

٤ مصنف بن أبي شيبة (١٥/٢٩٧) بسند صحيح.

٥ تاريخ الطبري (٥/٦٣٠).

هەردوو سوپا بەرەویەك كشان‌و دەستیان بە شەڕێکی وا توندو دەستەویەخە کرد کە لە شەڕی ڕۆژی یەکەم گەرمتر بوو، وردە وردە خەڵکی عێراق خەڵکی (شام)ی دەڕەتاند، (عبدالله ی کوڕی بەدیل) توانی قۆڵی چەپی سوپای (معاویە) بشکێنێت کە (حەبیبی کوڕی سەلەمە) سەرکردایەتی دەکرد ئیدی بەرەو کەتیبەی (شوهەبا)ی تایبەت بە (معاویە) پێشڕەوی کردو ئازایەتی‌و گەرم‌و گوڕیەکی بێ وێنەی نیشاندا، بەم بەرەوپێشچوونە کەمە سوپای (عێراق)ی هەستاندەوە، تا کار بەوە گەیشت (معاویە) لەبەر خۆیەوە باس لە چۆڵکردنی گۆڕەپانی جەنگ بکات، بەڵام بە قەولی ئەم شاعیرە دانی بەخۆدا گرت:

أبت لي عنقي وأبي بلائي وأخذي بالثمن الربيع
وإكراهي على المكروه نفسي وضربي هامة البطل المشيح
وقولي كلما جشأت وجاشت مكانك تحمدي أو تستريح[١]

ئیدی کەتیبەی (شوهەبا)ی هانداو هەڵناو توانیان (عبدالله ی کوڕی بەدیل)ی سەرکردەی باڵی ڕاستی سوپای عێراق بکوژن، (ئەشتەر) جێگەی (عبدالله)ی گرتەوە، خەڵکی شام پاڵیان وێکداو سوێندی مان‌و نەمانیان بۆ یەکتری دەخوارد، جارێکی تر بە فێڵ هەڵاتن‌و ئاوڕیان بۆ دانەوەو بەوپەڕی تواناو دڵقایمیەوە ڕووبەڕوویان بوونەوەو ژمارەیەکیان لێ کوژران کە هەرەدیارەکەیان (ذو الكلاع‌و حەوشەب‌و عوبەیدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتاب) بوون، بارودۆخەکە ئاوەژوو بۆوەو سوپای شام هەستایەوەو سوپای عێراق دەستی بە پاشەکشە کردو خەڵکێکی زۆرو زەوەندی لێ کوژراو بریندار بوو، هەر کە (عەلی) بینی سوپاکەی خەریکی پاشەکشەیە، یەکبەخۆ بانگی دەکردن‌و گەرموگوڕی دەکردنەوەو کوشتارێکی زۆری کردو ئەمجا بەرەو قۆڵی نێوەڕاست چوو کە لە تیرەی (ڕەبیعە) پێکهاتبوو، ئەمانە ئەهلی جەنگ‌و دەعوا بوون، دەماری خزمایەتیان جوڵاو سوێندی مان‌و نەمانیان بۆ (خالیدی کوڕی موعەممەر)ی ئەمیریان خوارد.[٢]

(عەمماری کوڕی یاسر) (خودا لێی ڕازی بێت) تەمەنی لە (٩٤)ساڵ سەری کردبوو، بەوپەڕی هێزو گوڕەوە دەجەنگا، خەڵکی هاندەداو هیمەتی بەبەردا دەکردن، بەڵام بە هیچ شێوەیەك توخنی زیادەڕەوی نەدەبۆوە، گوێی لە پیاوێك بوو لە تەنیشت ئەوەوە دەیوت: (خەڵکی شام کافر بوون)، عەممار نەیهێشت چی تر وا بڵێ‌و وتی: ئەوانە لە ئێمە یاخی بوون،

---

١ تاريخ الطبري (٥/٦٣٦).

٢ الاصابة (١/٤٥٤)، أنساب الأشراف (٢/٥٦)، بسند حسن الى قتادة.

ئێمەش بە خاتری یاخی بوونەکەیان جەنگیان لەگەڵ دەکەین، دەنا خودامان یەکە، پێغەمبەرمان یەکە، قیبلەمان یەکە.[١]

کاتێك (عەممار) هاوەڵەکانی خۆی بینی بەسەر پاشوانیاندا دەکشێنەوەو نەیارەکانیشی بەرەورووویان پێشڕەوی دەکەن، دەستی بە هاندانو غیرەت وەبەرهێنانو بەرزکردنەوەی هیممەتی یارەکانی کردو بۆی ڕوون دەکردنەوە کە: ئەوان لەسەر هەقنو، با بە گورزی بەهێزی شامیەکان تەفرە نەخۆنو لەو ئامانجەی بۆی هاتوون دانەبڕێن، ئەو (خودا لێی ڕازی بێت) دەیوت: کێ حەز دەکات (حۆریە چاو ئەستێرەکان) لە ئامێزی وەرێنن با بە ئامانجی پاداشتی خودا لە نێوان دوو ڕیزی سوپای شەڕەکەدا هەنگاو بەرەو پێشەوە هەڵێنێت، من پێم وایە ئەوانە بە جۆرێك بەر گورزتان دەدەن شكو گومانتان لەسەر دروست دەکەن، سوێند بەو زاتەی گیانی منی بە دەستە ئەگەر هێندەمان لێ بدەنو تا دارستانە خورمای (هەجەر)مان بەرن (کە زۆر دوورە) ئێستاش من باوەڕم وایە کە ئێمە لەسەر هەقینو ئەوانیش لەسەر ناهەقن، چاك دەزانم بەرژەوەندی ئێمە هەقەو هی ئەوانیش ناهەقە.[٢]

ئەمجا بەرەو پێشەوە ڕۆیشت، حەربەیەکی بە دەستەوە بوو بە هۆی پیریانی بە دەستیەوە دەلەرزیەوە، فەرمانی بە (هاشمی کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبی وەققاص) دەکرد توندو گشت بێت بەرەو پێشەوە هەنگاو بنێت، تەماعی نازو نیعمەتەکانی بەهەشتی دەخستە بەر چاوی ئەوو هاوەڵانیو دەیوت: بەهەشت نزیك بۆتەوە، حۆریە چاوگەشەکان ڕازێنراونەوە، کێ پێی خۆشە حۆریە چاو ئەستێرەکان لە ئامێزی بگرن، با بەرەو پێشەوە هەنگاو بنێتو هەڵمەت بەرێتو پاداشت لە خودا وەربگرێت.

(عەممار) دیمەنێکی سرنجڕاکێشوکاریگەری نێو گۆڕەپانی جەنگەکە بوو، ئەو هاوەڵێکی موهاجیری ڕێزداری پێغەمبەری خودا (ﷺ) بوو و بەشداری جەنگی بەدری کردبوو و تەمەنی لە (٩٤) ساڵی تێپەڕاندبوو و دارای ئەو هەموو حەماسەتو تواناو گیانی بەرزو یەقینی چەسپاو بوو، لەو ساتەوەختەدا بوو بە یەکێك لە هۆکارە هەرە کاریگەرەکانی گەرموگوڕکردنەوەی سوپای عێراقو بەرزکردنەوەی لایەنی ڕوحوڕەوانیانو وای لێ کردن ئەوپەڕی هێزو توانایان بەکار بخەنو گیانفیدایانە دەرەنجامی جەنگەکە بە باری

---

١ مصنف إبن أبي شيبة (١٥/٢٩٠) الإسناد حسن لغيره.

٢ مجمع الزوائد (٧/٢٤٣)، خلافة علي بن أبي طالب، عبدالحميد (ص: ٢١٩) إسناده حسن.

بەرژەوەندی خۆیاندا هەڵسوڕێنن، (هاشمی کوڕی عوتبە) بەرەو پێشەوە دەڕۆیشت ئەم هۆنراوەی دەخوێندەوە:

أعـور يبغي أهــله محــلاً قد عالج الحياة حتى ملا
لا بدّ أن يَفُلَّ أو يُفَلاّ[1]

(عەممار) دەیوت: هاشم بەرەو پێش بڕۆ، بەهەشت لە ژێر سێبەری شمشێراندایە، مەرگی (مەردانە)ش لە تەك سەرەڕمباندایە، دەروازەکانی ئاسمان خراونە سەر پشت، حۆریەکان ڕازێنراونەوە: ..........

اليوم ألقى الأحبة محمداً وحزبه.[2]

وەختی دەمەو خۆرئاوای ڕۆژی پێنج شەممە، (عەممار) داوای قاپە شیرێکی کرد، ئەمجا وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) پێی فەرمووم: ((إنَّ آخر شربة تشربها من الدنيا شربة لبن))[3] واتە: دوا شەربەتێك لە دنیادا بیخۆیتەوە قاپە شیرێکە. ئیدی (هاشمی کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبی وەققاص)ی ئاڵاهەڵگری هانداو پێکەوە خۆیان بەنێو کورەی جەنگدا کردو کوژران‌و نەگەڕانەوە،[4] خودا لە هەردووکیان ڕازی بێت‌و ڕەحمیان پێ بکات.

٣ـ شەوی (هەریر)و ڕۆژی (هەینی):

شەو داهات و شەڕ دەستی پێ کردەوە، پێکهەڵشاخان‌و پێکدادان بە جۆرێك بوو، لە جەنگی دوورو درێژی پێش خۆی زۆر توندتر بوو، خەڵکی عێراق بە دڵی گەرم‌و مەعنەویاتی بەرزیانەوە ڕاسان، کار بەوە گەیشت خەڵکی شامیان لە شوێنی خۆیان ڕەتاند، خودی عەلی ئەمیری ئیمانداران بەیعەتی مانونەمانی داو کوشتارێکی زۆر توندی کرد.[5] باسکراوە کە عەلی (خودا لێی ڕازی بێت) کاتی شێوان نوێژی ترسی بە سوپا کرد.[6]

شافیعی دەڵێت: لە (عەلی)یەوە چەسپاوە کە ئەو لە شەوی (هەریر)دا نوێژی ترسی ئەنجامداوە.[7] شایەتعەیانێك دەبێژێت: سێ ڕۆژو سێ شەو لەسەر یەك جەنگمان کرد، تا

---

١ تاريخ الطبري (٦٥٢/٥).
٢ تاريخ الطبري (٦٥٢/٥).
٣ مصنف إبن أبي شيبة (٣٠٢،٣٠٣/١٥)، بسند منقطع.
٤ تاريخ الطبري (٦٥٢/٥).
٥ المستدرك (٤٠٢/٣) قال الذهبي (ضعيف)، خلافة علي (ص: ٢٢٦).
٦ سنن الكبرى للبيهقي (٢٥٢/٣) قال الالباني: رواه البيهقي بصيغة التمريض أرواء الغليل (٤٢٠/٣).
٧ تلخيص الحبير (٧٨/٢)، خلافة علي (ص: ٢٢٧).

ئەوەی ڕمبەكان شكان، تیرەكان بڕان، دەستمان بە شەڕەشمشێر كرد، كە شمشێرەكانیش كول بوون بوونە داسولكە، بە ئاسن بە یەكمان دەكێشا، وامان لێهات ملمان لەبەر ملی یەكتر نا، بێ لە مشەمش‌و گرمەی خەڵك دەنگێكی تـرت نەدەبیست، ئـەمجا بـە بـەرد لێكترمانـدا، خۆڵمان بە یەكتر هەڵپڕژاند، بە دەم‌وددان یەكترمان گەست، ئەم كارەمـان بـەردەوام بـوو تـا بەیانی هەینی داهات، خۆریش هەڵات، خەریك بوو لەبەر تۆزی جەنگ چاو نەبینێت، ئاڵایەكان هەر هەموویان كەوتبوونە زەوی، سوپا بڕستی لێ بڕابوو، دەست‌و بازۆڵە شكابوون، گەرو وشك هەڵگەڕابوون.[١]

(إبن كثير) لـە وێنـاكردنی شـەوی (هـەریر)و ڕۆژی (هـەینی)دا دەڵێـت: دوو نەفـەر ڕاست دەبوونـەوەو خۆیـان بـە یـەكتردا دەدا، بـە ددان یـەكتریان دەگەسـت، تـا خـوێن دەهاتـە خـوارەوە، بـەردەوام بـە یـەكیان دەكێـشا تـا ئـەوەی زۆر شـەكەت دەبـوون، دادەنیـشتن‌و پـشوویان دەدا، بـەم حاڵـەش ڕانەدەوەسـتان خۆڵیـان بـە یـەكتردا دەكـرد ، ئـەمجارەش هەڵدەستانەوە، وەكو پێشدا لەبـەر یـەك ڕادەچوونەوە (فإنـا لله وإنـا إليـه راجعـون)، ئەمـە ئیش‌و پیشەیان بوو تا سپێدەی بەیانی هەینی هەڵات، جەنگیان بـە سـەركردایەتی كـێ كـرد نوێژیشیان بـە ئیمامـەتی هـەمان كـەس كـرد ، هـەر كـە سـەلامیان دایـەوە، تـا چێشتەنگاو دەستیان كردەوە بە كوشتار، لە ئەنجامدا خەڵكی عێراق بەسەر خەڵكی شامدا سەركەوتن.[٢]

ﻫـ بانگەشەی (تەحكیم):

هەردوو سوپا پاش شەوی (هەریر) هێند شپرزە ببـوون نەیانـدەتوانی چیتر شـەڕ بكـەن، (ئەشعەثی كوڕی قەیس)ی سەرۆكی (كیندە) لە شەوی (هەریر)دا وتارێكی ئاراستەی خـەڵكی خۆی كـردو وتـی: موسـڵمانان: بـە چـاوی خۆتـان بینیتـان ڕۆژی ڕابـردوو چ ڕوویـداو، چـەند (عەرەب) لە بەین چوون، سوێند بێت بە خـوا بـە ویـستی خـودا گەیـشتوومەتە ئـەم تەمەنـە دووروو درێژە، تاكو ئێستا وێنەی ئەم شەڕەم نەدیوە، جا كێ لێرە ئامادەیە، بـا ئـەم قـسەی من بەو كەسانە ڕاگەیەنێت كە لێرە نین، ئەگەر تا سبەی ڕێك نەكەوین عەرەب هەمووی لەنێو دەچێت، حورمەو شتە پیرۆزەكان، هەر هەموویان زایە دەبن، بـەڵام سـوێند بێـت بـە خـودا: ئەم قسە لەبەر ئەوە ناكەم لە ترسی جەنگ كەوتبمە هەڵپە، نا، بەڵكو من پیاوێكی بە تەمەن (ی ئەزموونديدەم)، ئێمە سبـەی كـە لـەنێو چـووین، دەترسـم ژن‌و منـداڵمان تووشـی بـەڵای

---

١ شذرات الذهب (٤٥/١)، وقعة صفين (ص: ٣٦٩).

٢ البداية والنهاية (٢٨٣/٧).

خۆیان ببن، خودایە تۆ چاك دەزانی من بیروڕاو ئامۆژگاری خۆم ئاراستەی گەلی خۆم و خەڵکی سەربەدینی خۆم کردو کەمتەرخەمیم نەکردووە.[١]

ئەم قسانەی (ئەشعەث)یان بۆ (معاویە) گێڕانەوە، ئەویش وتی: سوێند بە پەروەردگاری کابە پێکاویەتی، گەر ئێمە بەیانی پێکهەڵخاشاین، ڕۆمەکان بەسەر ژن‌و منداڵەکانماندا دەدەن، فارسەکانیش بەسەر خەڵکی عێراق‌و ژن‌و منداڵەکانیاندا دەدەن، تەنها خەڵکانی بە ئاوەزو دووربین ئەمە دەبینن، ئەمجا بە هاوەڵەکانی وت: (مصحف)ەکان بەسەر سەرە ڕمبەکاندا بکەن.[٢]

ئەم ڕیوایەتە خەڵکی (عێراق) گێڕاویەتیەوەو نە باسی (عەمروی کوڕی عاص)ی تێدایە، نە باسی هەڵخەڵەتاندن‌و فێڵی تێدایە، بەڵکو ئەمە حەزو ئارەزووی هەردوولا بووە، نە (معاویە) نە (عەلی) یەك تۆز زیانیان پێ ناگات، کەغیرەت‌و ئازایەتی وا لە یەکێکیان بکات دەستپێشخەری ئاشتی بکات‌و ئەوەندە هێزەی کە ماوە، لە فەوتان ڕزگار بکات، نەخێر ئەمە تەنها ئەو دوژمنانە هەراسان دەکات کە ئاگری فتیلەی ئاشوبەکەیان هەڵکردو کۆمەڵێك ڕیوایەتی کەڵەکەبووی چەواشەکەریان سەبارەت بەمە بۆ ئێمە بەجێ هێشتووە، هەق بە ناهەق‌و چاکە بە خراپە نیشان دەدەن، ئەوان بانگەشەی (تەحکیمی قورئان) بە فێڵ‌و تاوان‌و پیلان دادەنێن، چونکە بە هۆیەوە خوێنی موسڵمانانی پێ پارێزرا.[٣]

قسەگەلێکی هەڵبەستراو دەخەنە پاڵ (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران کە پێچەوانەی ڕیوایەتە (صحیح)ەکانن، دەڵێن (عەلی) وتوویەتی:ئەوان قورئانیان بەرز نەکردۆتەوە، ئەمجا بەرزیشی ناکەنەوەو، کار بە نێوەڕۆکەکەی ناکەن، ئەوان تەنها بە فرتوفێڵ‌و چاوبەستەکی کردنی ئێوە بەرزیان کردۆتەوە.[٤]

یەکێك لەو جنێوانەیان کە سەبارەت بە بەرزکردنەوەی (موصحەفەکان) وتیان ئەمەیە: ئەمە بە ڕاوێژی داکقەحبەکە بووە.[٥] ئیدی بازنەی پڕوپاگەندەی دژ بە (عەمروی کوڕی عاص) (خودا لێی ڕازی بێت)یان هێندە فراوان کرد، تا ئەو حاڵەی کتێبێکت لەنێو کتێبە مێژووییەکان دەست ناکەوێت باسی کەموکوڕیەکانی نەکات‌و نەڵێ: عەمرو تەڵەکەبازو

---

١ وقعة صفين للمقريزي (ص: ٤٧٩).

٢ المصدر نفسه (ص: ٤٨١، ٤٨٤).

٣ الدولة الاسلامية في عصر الخلفاء الراشدين (ص: ٣١٦).

٤ الكامل (٢٠/٣٨٦).

٥ المصدر نفسه (٥/٦٢٢، ٦٦٣).

پیلانگێڕ نەبووە، هەموو ئەمە بە هۆکاری ئەو ڕیوایەتە زۆرانەی لە لایەن دوژمنانی هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خودا (ﷺ)ەوە هەڵبەستراونو ئەمجا (طبري)و (إبن كثير)و مێژوونووسانی تریش کتێبەکانی خۆیانیان پێ ئاخنیون، زۆرێکیش لە مێژوونووسە هاوچەرخەکانی وەکو (حسن إبراهيم) لە (تاريخ الاسلام)ەکەیداو (محمد الخضري بك) لە (تاريخ الدولة الأموية) ەکەیداو، (عبدالوهاب النجار) لە (تاريخ الخلفاء الراشدون)ەکەیداو غەیری وانیش، بەو دەردەوە گیرۆدە بوونو بە هۆی گواستنەوەی ئەم ڕیوایەتە هەڵبەستراوانە بەشداری شێواندنو تەڵخکردنی ئاوێنە پاکەکەی مێژووی ئیسلامیان کردووە.

ڕیوایەتەکەی (أبي مخنف) وا دادەنێ کە کاتێك خەڵکی شام پێشنیازەکەی خۆیان سەبارەت بە (تەحکیمی قورئان) ڕاگەیاند، (عەلی) ڕەتی کردەوە، بەڵام دوایی لە ژێر گوشاری ئەو (قورڕاء)انەی کە دوایی بە (خەواریج) ناویان دەرکرد وەڵامی پێشنیارەکەیانی بە ئەرێ دانەوە.[1] ئەم ڕیوایەتە کۆڵێك جنێوی وای لە خۆ گرتوون کە گوایە (عەلی) بە (معاویە)و هاوەڵەکانی وتبن، کە حاشاو هەرگیزاو هەرگیز جوێنی ئاوا لەم نەوە موبارەکە (واتە جیلی هاوەڵان) نەبیستراون، چ جای لە سەروەرەکانیان، لە سەرووشیانەوە (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران، ئەوەندە بەشی فرێدانی ڕیوایەتەکە دەکات کە یەکێکی ڕافیزەی وەکو (ئەبی مەخنەف) لەنێو زنجیرەی سەنەدەکەیدا بێت، ئەمە ڕیوایەتێکە نە لە بەرانبەر توێژینەوەی خاوێندا خۆ دەگرێت، نە لە بەرانبەر ئەم ڕیوایەتەشدا خۆ دەگرێت کە (ئیمام أحمدی کوڕی حەنبەل) لە ڕێی (حەبیبی کوڕی أبي ثابت)ەوە گێڕاوەیتیەوە: (حەبیب) وتی: (ئەبو وائیل) سەربازێکی (عەلی کوڕی ئەبی طالب) بوو، چووم بۆ لایو سەردانم کرد، (ئەبو وائل) وتی: ئێمە لە (صەفین) بووین، کاتێك خەڵکی شام کوشتارێکی زۆریان لێکرا، (عەمرو) بە (معاویە)ی وت: (موصحەف)ەکە بۆ لای (عەلی) بنێرە، بانگی بکە بەرەو کتێبی خودا، بێگومان دەست بە ڕووتەوە نانێت، جا کاتێك بە (قورئان)ەکەوە هاتو وتی: کتێبی خودا لە نێوانماندا دەبێتە نێوبژیوان (حەکەم)، ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَـٰبِ يُدْعَوْنَ إِلَىٰ كِتَـٰبِ ٱللَّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ وَهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٣﴾﴾[2]. وتی: بەڵێ، من بۆ ئەمە لە پێشترم، (قورڕاء)ەکان کە پاشان بوونە (خەواریج) شمشێریان بە شاندا کردبوونو وتیان: ئەی ئەمیری ئیمانداران: بۆ هەڵمەت بۆ ئەوانە نەبەین تا خودا یەکێکمان بە یەکێکمان لەنێو

---

١ المصدر نفسه (٥/٦٢٢، ٦٦٣).

٢ ال عمران (٢٣).

دەبا ؟(سەهلی کوڕی حونەیفی ئەنصاری) (خـودا لێـی ڕازی بێـت) هەسـتایە سـەرپێ‌و وتـی: ئەی خەڵکینە، ئێوە خۆتان تاوانبار کەن، ئێمە لە ڕۆژی (حودەیبیە)دا لەگەڵ ڕەسولی خـودا (ﷺ) بووین، ئەگەر شەڕمان پێ فرۆشرابایە شەڕمان دەکرد، ئەمە لە کاتی ئـەو (صـوڵحە)دا بـوو کـە لـە نێـوان پێغەمبـەری خـودا (ﷺ)و بتپەرسـتەکاندا ئەنجامـدرا، ئـەمجا باسـی ناڕەزاییەکەی عومەرو دابەزینی سورەتی (الفتح)ی کـرد، (عـەلی) وتـی: ئـەی خەڵکینـە ئەمـە فەتح‌و سەرکەوتنە، پێشنیارەکەی قەبوڵ کردو خۆی‌و خەڵك گەڕانەوە.[١]

(سەهلی کوڕی حونەیف) (خودا لێی ڕازی بێت) سەرسوڕمانی خۆی نیشاندا لـە بەرامبـەر کەسـانێکدا بانگەشـەی درێژەپێـدانی جـەنگی نێـوان برایـان دەکـەن‌و وتـی: ئـەی خەڵکینـە دینەکەتان بکەنە حەکەم، ڕای خۆتان بە چەوت دانێن.[٢]

ئەمجا بۆی ڕوون کردنەوە: کە ئێستا هـیچ شـتێك لـە گفتوگۆو صـوڵح باشـتر نیـەو هـەر شتێکی تر بێ لە مە پێڕەو بکرێت، ئاشوبەو دەرەنجامەکەی مەترسـیدارە، ئـەو وتـی: پـێش ئەم شەڕو گێچەڵەی هەر جارێك شمشێرەکانمان کردبێتە شانمان‌و بەرەو جەنگ چووبین ئـەو چەك هەڵگرتنەمان ئێمەی بـەرەو ئامـانجێکی زانـراو پـەلکێش کـردووە، بـەڵام نـازانین چـۆن چارەی ئەم فیتنەی ئێوە بکەین کە هەڵتانگیرساندووە، هەتا کەلێنێکی دەگرین لە کەلێنێکی ترەوە سەر هەڵدەداتەوە.[٣]

ئەم ڕیوایەتە (صحیح)انە بەرپەرچی جارچیانی ئاشوبو داخلەدڵانی هاوەڵان دەدەنەوە، ئەو داخلەدڵانە بـە ئامـانجی چـاندنی تـۆوی ڕق‌و قینـە لـە دڵ‌و دەروونەکانـداو درێژەپێـدانی ئاشـوبەکە کـاری زۆریـان کـردووەو زۆر هـەواڵی درۆو دەلەسـەیان سـەبارەت بـەم ڕووداوە هەڵبەسـتوون‌و شـێعری حەماسـییان بـە نـاوی هاوەڵـە گـەورەکان‌و تابیعیـە بەناوبانگـەکان هۆنیونـەوە،[٤] بانگەشـەی (تـەحکیمی قورئـان) بـەبێ باسـکردنی مەسـەلەی ڕادەسـتکردنی بکوژانی عوسمان بە معاویەو، قبـوڵکردنی (تـەحکیمی قورئـان) بـەبێ باسـکردنی مەسـەلەی بەیعەتـدان‌و گوێڕایـەڵی‌و فەرمانبـەرداریکردنی (معاویـە) بـۆ (عـەلی)، بابـەتێکی تـازە بـووو ڕووداوەکانی گۆڕەپانی جەنگی (صەفین) سەپاندیان: چـونکە جـەنگی نـاوبراو موسـڵمانێکی زۆری کردنــە ســوتەمەنی خــۆی‌و لــەنێوی بــردن، ئەمــە بیروبۆچــوونێکی دەســتەجەمعی

---

١ مصنف إبن أبي شيبة (٨/٣٣٦)، مسند أحمد مع الفتح الرباني (٨/٤٨٣).

٢ البخاري (رقم: ٤١٨٩).

٣ البخاري (رقم: ٤١٨٩).

٤ الانصاف فيما وقع في تاريخ العصر الراشدي من الخلاف (ص: ٥٢٠).

بەدەرخستو پێی وابوو: وەستاندنی جەنگو بەرگرتن بەڕژێنرانی خوێن زەرورەتێکە پاراستنی سامو هەیبەتو هێزی دەسەڵاتی ئوممەت لە بەرانبەر دوژمنانیدا داوای دەکات، بێگومان ئەمە بەڵگەیە لەسەر زیندووبوونو بەئاگابوونی ئوممەتو کاریگەری زاتیو بابەتیانەی لەسەر دەرکردنی بڕیارەکانی خۆی لە لایەن خۆیەوە.[١]

(عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران (خودا لێی ڕازی بێت) وەستاندنی جەنگی (صەفین)ی قبوڵ کردو بە (تەحکیم) ڕازی بوو، ئەمەی بە سەرکەوتن هەژماردو یەکسەر بەرەو کوفە گەڕایەوەو،[٢] ژمارەیەك ئاواتو خۆزگەی وەك (نەهێشتنی ناتەبایی‌و یەکخستنی وشەو بڕیارو یەکڕیزی‌و بەهێزکردنی دەوڵەتو بەگەڕخستنەوەی سەرلەنوێی بزووتنەوەی فتوحات)ی بە (تەحکیم)ەوە بەستەوە.

بێگومان چەند هۆکارێك پاڵپشتی جێبەجێکردنی بیرۆکەی (تەحکیم)و بەشداری بە یەکگەیشتنی هەردوو لایان کرد، لەم هۆکارانە:

أ- ئەمە دواهەمین هەوڵ بوو لەنێو هەموو ئەو هەوڵە دەستەجەمعی‌و تاکەکەسیە سەرنەگرتووانەی پاش جەنگی (جەمەل) بە خاتری وەستانی شەڕو هەراو ڕژانی خوێن خرابوونەگەڕ، هەموو ئەو نامانەی لە نێو هەردوولادا گۆڕدرانەوە سودێکیان نەگەیاند، دواهەمین هەوڵ لە ڕۆژانی گەرمبوونی کورەی جەنگدا لە لایەن (معاویە)وە ئیشی لەسەر کراو، نامەیەکی بۆ (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) ناردو داوای وەستاندنی جەنگی لێکردبوو و گوتبووی: وەك هەردوولامان دەزانین‌و ناتوانین لە خۆمانی بشارینەوە جەنگو خوێنڕێژی لە سنوور دەرچوو، کە تا ئێستا بەسەر ئەقڵو ئاوەزماندا زاڵ بووین، خۆ ئێستا ئەوەندەمان پێ ماوە چاکی بکەینەوەو پێی لە ڕابردوو پەشیمان ببینەوە.[٣]

ب- زۆری کوژراوان‌و ڕژانی خوێنی زۆرو ترسان لە لەنێوچوونی یەجگاری، ئەمە وایکرد وەستاندنی شەڕ ببێتە داخوازیەکی هەمەلایەنەو وێکڕا تەمایان پێ بێتو چاوی تێ بڕن.

ج- بێزاربوونی خەڵك لە درێژبوونەوەی جەنگ، کار بەوە گەیشتبوو هەر هەموو گوێی خۆیان بۆ بیستنی دەنگی (صوڵح) هەڵخستبوو، زۆرینەی سوپاکەی (عەلی) لەگەڵ (صوڵح) بوون‌و لێکدا لێکدا دەیانوت: ئاگری جەنگ هەمووی خواردین، مانەوەمان بە (صوڵح)ەوە بەندە.[٤]

١ دراسة في تاريخ الخلفاء الأمويين (ص: ٣٨).

٢ المصدر نفسه.

٣ الأخبار الطوال للدينوري (ص: ١٨٧)، دراسات في عهد النبوة (ص:٤٣٢).

٤ صفين (ص: ٤٨٢- ٤٨٥)، دراسات في عهد النبوة (ص: ٤٣٣).

ئەمە بەرپەرچی هەموو ئەو هاشوهوشو تۆمەتەڕەواجیێدراوانە دەداتەوە كە دەڵێن: بەرزكردنەوەی موصحەفەكان بە پیلانو فرتوفێڵی (عەمروی كوڕی عاص) بووە، لە ڕاستیدا بیرۆكەی بەرزكردنەوەی موصحەفەكان بە نیسبەت ئەو ڕۆژەوە شتێكی تازە نەبوو، بەڵكو (كەعبی كوڕی سور)ی قازی (بەصرە) یەكەم كەس بوو لە جەنگی (جەمەل)دا (موصحەف)ی بەرزكردەوەو بوو بە نیشانەی تیرێكو كوژرا.

سـ- وەڵامدانەوەی بانگهێشتی (وەحی) بۆ (صوڵح)، خودای بەرز فەرمووی: ﴿فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾[1] واتە: ئەگەر لەسەر شتێك كەوتنە كێشەوە (بۆ چارەسەركردنی) بۆ لای خوداو پێغەمبەر بگەڕێنەوە. كاتێك (عەلی كوڕی ئەبو تالیب) پێشنیاری (تەحكیمی قورئان)ی بۆ خرایە ڕوو وتی: بەڵێ، من بۆ قبوڵكردنی ئەمە لە هەموو كەس لەپێشترم، با كتێبی خودا لە نێوانماندا نێوبژیوان بێت،[2] ئەم وتەیەی (عەلی) بەڵگەیە لەسەر ئەوە كە ئەوان وەڵامی بانگی خودایان داوەتەوە.

**٥ـــ كوژرانی (عەمماری كوڕی یاسر) (خودا لێی ڕازی بێت) و كاریگەری لەسەر موسڵمانان:**

ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) كە ئاراستەی (عەممار) (خودا لێی ڕازی بێت)ی كردووە: ((تقتلك الفئة الباغية))[3] واتە: (گروهیە یاخیبووەكە دەتكوژێت). لە ڕیزی فەرموودە هەرە صەحیحو چەسپاوەكانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) دێتە هەژمار، بۆیە كوژرانی ئەو هاوەڵە كاریگەری خۆی لەسەر خودی جەنگی (صەفین) دانا، ئەو سومبولو بەیداخی هاوەڵانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) بوو و بۆ هەر شوێنێك ڕۆیشتبایە بە دوایدا دەڕۆیشتن، (خەزێمەی كوڕی ثابت) لە جەنگەكەدا ئامادە بوو، بەڵام چەكەكەی فرێدابوو كاتێك بینی (عەممار) كوژرا، یەكسەر فەرموودەكەی پێغەمبەری خودا (ﷺ)ی یاد كەوتەوە كە بە (عەممار)ی فەرمووبوو: (تاقمە یاخی بووەكە دەتكوژن)، بۆیە بە پەلە شمشێرەكەی تیژكردەوەو بەرەنگاری خەڵكی شام بووەوە تا نەكوژرا كۆڵی نەدا.[4]

---

١ النساء (٥٩).

٢ مصنف إبن أبي شيبة (٨/٣٣٦).

٣ مسلم (رقم: ٢٩١٦).

٤ خلافة علي (ص: ٢١١).

کوژرانی (عەممار) کاریگەری لەسەر سەربازگەی (معاویە)ش دانا، ئەمە (عبدالرحمنی سەلەمی)یەو، خۆ بەنێو سەربازگەی (شام)دا دەکات، (معاویەو عەمروی کوڕی عاصو عبداللهی کوڕی عەمروو ئەبو ئەعوەری سەلەمی) لەسەر ئەو کانی و جۆگایەی (کە تاکە سەرچاوەی خواردنەوەی هەردوو لایانە) دەبینێت ئاو دەخۆنەوەو سەبارەت بە کوژرانی (عەممار) گفتوگۆ دەکەن، (عبدالله ی کوڕی عەمرو) بە (عەمرو)ی باوکی دەڵێت:

ئێمە ئەو پیاوەمان کوشت، پێغەمبەری خوداش (ﷺ) ئەم فەرموودەیەی دەرهەق فەرمووە، (عەمرو) وتی: کام پیاوە؟! (عبدالله) وتی: (عەمماری کوڕی یاسر)... پێغەمبەری خودا فەرموویەتی کە (تاقمە یاخی بووەکە دەیکوژێت).

(عەمرو)ش ڕوو لە (معاویە) دەکاتو دەڵێت: ئێمە ئەم پیاوەمان کوشت، پێغەمبەری خوداش (ﷺ) فەرموودەیەکی ئاوای دەرهەق فەرمووە!

(معاویە) وتی: وسبە، بە خوا ئێستاشی لەگەڵ بێت پێ لە جێ میزی خۆت بنێی هەڵدەخلیسکێی، ئەوە دەڵێی: ئێمە کوشتومانە؟ نا، هەر ئەو کەسە کوشتوویەتی کە لەگەڵ خۆیدا هێناوە،[1] ئیدی چۆن ئاگر خۆ بەنێو پوشو پەڵاشدا دەکات، ئاواش تەئویلەکەی (معاویە) بۆ فەرموودەکە بەنێو خەڵکی (شام)دا تەشەنەی کردو بڵاوبووەوە.

لە ڕیوایەتێکی صەحیحدا هاتووە: (عەمروی کوڕی حەزم) دەچێتە لای (عەمروی کوڕی عاص)و دەڵێت: (عەممار) کوژراو، پێغەمبەری خوداش (ﷺ) فەرموویەتی کە: کۆمەڵە خەڵکێکی سەرپێچیکار دەیکوژن، (عەمروی کوڕی عاص) ترسو بیم دایدەگرێتو خێرا بۆ لای (معاویە) دەگەڕێتەوە، (معاویە) پێی دەڵێت: ئەوە چیتە؟ (عەمرو) دەڵێت: (عەممار) کوژراوە، (معاویە) دەڵێت: عەممار کوژرا کوژرا، جا چیە؟ (عەمرو) دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بوو پێی دەفەرمووێت: ((تقتلك الفئة الباغية)) واتە: تاقمە لە هەق دەرچووەکە دەتکوژێت، (معاویە) پێی دەڵێت: دەڵێی لەسەر میزی خۆت هەڵخلیسکاوی، ئاخر ئەوە ئێمە کوشتوومانە؟، (عەلی)و داروودەستەکەی کوشتوویانە، هێنایان تا خستیانە بەر ڕمبەکانی ئێمە، یان وتی: شمشێرەکانی ئێمە.[2]

---

١ مسند أحمد (٢/٢٠٦) إسناده حسن.

٢ مصنف عبدالرزاق (١١/٢٤٠) بسند صحيح.

هەروەها لە ڕیوایەتێکی صەحیحدا هاتووە:

دوو کەس هاتنە لای (معاویە)و دەربارەی کەللەسەری (عەممار) مشتومڕیان بوو، هەریەکەیان دەیوت: کە ئەو کوشتوویەتی، (عبداللە ی کوڕی عەمروی کوڕی عاص) وتی: با یەکێك لەم دووانە عائیدی بەرانبەرەکەی بکات، من گوێم لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بوو دەیفەرموو: ((تقتلك الفئة الباغية)) واتە: گروهە ستەمکارەکە دەیکوژێت.

(معاویە) پێی دەڵێت: ئەدی بۆ لەگەڵ ئێمەدای؟ وتی: جارێك بابم لە خزمەتی پێغەمبەری خودا (ﷺ) شکایەتم لێ دەکات، پێغەمبەریش (ﷺ) پێی فەرمووم: ((أطِع أباك مادام حياً، ولا تعصه)) واتە: تا باوکت لە ژیاندا بێت دەبێت فەرمانبەرداری بیتو نابێت سەرپێچی بکەی. ڕاستە لەگەڵتاندام، بەلام جەنگ ناکەم.[1]

لەم ڕیوایەتانەی ڕابردن تێبینی دەکەین، کە چۆن هاوەڵی زانا (عبداللە ی کوڕی عەمروی کوڕی عاص) (خودا لێیان ڕازی بێت) سوورە لەسەر کردنی قسەی هەقو دەربڕینی دڵسۆزیو ئامۆژگاری، ئەو پێی وابوو بە حوکمی ئەوە (معاویە)و سەربازەکانی (عەمماری کوڕی یاسر)یان کوشتووە، کەواتە ئەوان ڕاست بریتین لە (تاقمە یاخی بووەکە)، ئەو چەندین جارو لە بۆنە جیاجیاکاندا ئەمەی ڕاگەیاندووەو ناڕەزایی خۆی لە بەرانبەر کوژرانی (عەممار)دا دەبڕیوە.

هیچ شكو گومانی تێدا نیە کە کوژرانی (عەممار) بە هۆکاری ئەم فەرموودەیە کاریگەری زۆری لەسەر دڵو دەروونی خەڵکی (شام) دروست کرد، بەلام (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) واتایەکی نادروستی بۆ فەرموودەکە کرد، چونکە بە هیچ شێوەیەك ڕاست نیە، ئەو کەسانەی (عەممار)یان کوشتووە هەر ئەوانە بن کە هێناویانە بۆ نێو گۆڕەپانی جەنگەکە.[2]

کوژرانی (عەممار) کاریگەری زۆری لەسەر (عەمروی کوڕی عاص)یش دروست کرد، بەڵکو خودی شەهیدبوونەکەی (عەممار)، (عەمروی کوڕی عاص)ی هاندا هەوڵو تەقالاکانی خۆی لە پێناوی کۆتایی پێهێنانی جەنگەکەدا بخاتە گەڕ.[3] (عەمرو) (خودا لێی ڕازی بێت) وتی: حەزم دەکرد بە بیست ساڵ بەر لەم ڕۆژە بمردبامایە.[4]

---

١ مسند أحمد (١١/١٣٨، ١٣٩) أحمد شاكر دەڵێت: سەنەدەکەی (صحيح)ە.

٢ خلافة علي بن أبي طالب، عبدالحميد (ص: ٣٢٥).

٣ (معاوية) بن أبي سفيان، للغضبان (ص: ٢١٥).

٤ أنساب الاشراف (١/١٧٠)، عمرو بن العاص للغضبان (ص: ٦٠٣).

(بوخاری) لە (ئەبو سەعیدی خودری) (خودا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کە وتی: ئێمە (لە کاتی دروستبوونی مزگەوتی پێغەمبەردا) یەك یەك خشتەمان هەڵدەگرتن، بەڵام (عەممار) دوو دوو هەڵی دەگرتن، پێغەمبەر (ﷺ) بینی‌و تۆزی لە پشت دەتەکاندو دەیفەرموو: ((وَيحَ عمّار تقتله الفئة الباغية، يدعوهم إلى الجنة ويدعونه الى النار)) واتە: وەیش (عەممار)! تاقمە یاخیەکە دەیکوژێت، بەرەو بەهەشت بانگیان دەکات، ئەوانیش بەرەو دۆزەخ بانگی دەکەن. (عەممار) وتی: پەنا بە خودا دەگرم لە ئاشوب.[1]

(إبن عبدالبر) دەڵێت: ئەم ڕیوایەتەی لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) پێمان گەیشتووە، کە دەفەرموێت: (تاقمە یاخیەکە (عەممار) دەکوژێت). پلەی (تەواتور)ی وەرگرتووە، ئەم فەرموودەیە وێڕای ئەوەی لە ڕیزی پێشەوەی فەرموودە صەحیحەکانە، یەکێکیشە لە نیشانەو بەڵگەی پێغەمبەرایەتی (ﷺ).[2]

(ذهبي)یش پاش هێنانی فەرموودەکە دەڵێت:

هاوەڵانێکی زۆر ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە کەواتە (موتەواتیرە).[3]

**چۆنیەتی تێگەیشتنی زانایان لە فەرموودەکە:**

أ- (إبن حجر) دەڵێت: ئەم فەرموودەیە ئەم چەند شتانەی لەخۆگرتووە: نیشانەیەك لە نیشانەی پێغەمبەرایەتی، شکۆداری (عەلی‌و عەممار)، بەرپەرچدانەوەی(نواصب) ئەو خەواریجانەی لە دژی عەلی هەڵگەڕانەوەو پێیان وابوو (عەلی) لە ئیجتیهادە جەنگیەکانیدا نەیپێکاوە.[4] هەروەها دەڵێت: فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوە: تاقمە یاخی بووەکە (عەممار) دەکوژێت، (عەلی) لەم جەنگانەیدا هەق بووەو پێکاویەتی، چونکە لایەنگرانی (معاویە) کوشتوویانە.[5]

ب- (نووي) دەڵێت: هاوەڵان بە حوکمی ئەو فەرموودەیە دەیانزانی (عەممار) لەگەڵ تاقمە ڕاستڕەوەکەیە، بۆیە لە جەنگی (صفین)دا ڕووی لە کوێ کردبایە ئەوانیش ڕوویان لە ئەوێ دەکردو بە دوای ئەو دەکەوتن.[6]

---

١ البخاري (رقم: ٤٤٧).

٢ الاستيعاب (١١٤٠/٣).

٣ سير أعلام النبلاء (٤٢١/١).

٤ فتح الباري (٦٤٦/١).

٥ فتح الباري (٩٢/١٣).

٦ تهذيب الأسماء واللغات (٣٨/٢).

ج- (إبن کثیر) دەڵێت: لەنێو دوو تاقمەکەدا (عەلی)و هاوەڵانی لە هەقەوە نزیکتر بوون لە هاوەڵانی معاویە، هاوەڵانی (معاویە) لە ئەوان یاخی ببوون، هەروەکو لە (صەحیحی موسلیم)داو لە فەرموودەی (شعبة)دا چەسپاوە، کە لە (ئەبی سەلەمە)وە، ئەویش لە (أبي نضرة)ەوە، ئەویش لە (أبی سەعیدی خودری)یەوە گێڕاویەتیەوەو دەڵێت: ئەو کەسەی لە من باشترە واتە (ئەبا قوتادە) قسەی بۆ کردم کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بە (عەممار)ی فەرموو: ((تقتلك الفئة الباغية))[1] هەروەها دەڵێت: ئەمە (عەمماری کوڕی یاسر)ەو لەگەڵ (عەلی کوڕی ئەبو تالیب)ی ئەمیری ئیمانداران بووو کوژرا، خەڵکی شام کوشتیان، بەمە ڕازی هەواڵدانەکەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەرکەوت کە فەرمووبووی: تاقمە سەرپێچیکارەکە دەیکوژن، بەم شێوەیە ڕوون بۆوە کە: (عەلی) خاوەن هەقەو (معاویە) سەرپێچیکارە، ئەمە جگە لەوەی کە نیشانەیەك لە نیشانەکانی پێغەمبەرایەتیش دەرکەوت.[2]

د- (ذهبي) دەڵێت: بە دەقی فەرموودەی پێغەمبەری هەڵبژاردە (ﷺ) کە ئاراستەی (عەممار)ی کرد: ((تقتلك الفئة الباغية)) واتە: تاقمە سەرپێچیکارەکە دەتکوژن. ئەوانە (معاویەو هاوەڵانی) تاقمەیەك بوون لە ئیمانداران لە (ئیمام عەلی) یاخی ببوون.[3]

هـ - قازی (أبوبکری إبن العربی) سەبارەت بە فەرموودەی خودای بەرز: ﴿وَإِن طَآئِفَتَانِ﴾[4] دەڵێت: ئەم ئایەتە بنەمایەکە بۆ جەنگو کوشتاری موسڵمانان، بەڵگەیەکە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی تەئویلکاران، هاوەڵان پشتیان پێ بەستووە، ناودارانی ئەم ئومەتە پەنایان بۆ بردووە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) بە فەرموودەی: ((تقتل عمار الفئة الباغية)) لای بە لادا کردووەتەوە.[5]

و- (إبن تیمیة) دەڵێت: ئەمە دەبێتە بەڵگە لەسەر: ڕاستو دروستبوونی ئیمامەتی (عەلی)و، واجب بوونی گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەرداری بۆ ئەو، بانگهێشتکەری فەرمانبەرداریکردنی بانگهێشتکەری سەرڕێی بەهەشتە، بانگهێشتکەری شەڕ لەگەڵ کردنی بانگهێشتکەری سەرڕێی دۆزەخە، ئەگەرچی تەئویلکەریش بێت، شەڕکردن لە دژی (عەلی)

---

١ البداية والنهاية (٦/٢٢٠).
٢ البداية والنهاية (٧/٢٧٧).
٣ سير أعلام النبلاء (٨/٢٠٩).
٤ الحجرات (٩).
٥ أحكام القرآن (٤/١٧١٧).

دروست (جائز) نیە، شەڕکەری دژی ئەگەر تەئویلی خۆی هەبوبێت ئەوان لە هەڵەدا بووەو نەپێکاوە، ئەگەر تەئویلیشی نەبووبێت ئەوا یاخی (باغ) بووە، بێگومان ئەم بڕگەی دووەمە پەسەندی هاوڕێیانمەو ڕاسترینی دوو ڕایەکەیە، بەڵام بڕگەی یەکەم کە حوکمی هەڵە (خطأ) بەسەر جەنگاوەرانی دژی (عەلی)دا دەدا، ئەوە ڕای ئیمامانی سەرمەزەبی فیقهەو لە کتێبەکانیشیاندا دەروازەیەکیان بە ناوی (قتال البغاة المتأولين) واتە: (کوشتاری یاخیانی خاوەن تەئویل) کردووەتەوە.[1]

هەروەها دەڵێت: لەگەڵ ئەوەدا کە دان بەوەدادەنێین (عەلی) لەو خەڵکانەی لێی یاخی بوونو لە دژی دەرچوون هەقتر بووە، (عەممار)یش بە گوێرەی دەقی فەرموودەکان تاقمە یاخیەکە کوشتوویەتی، کەواتە پێویستە لەسەرمان، باوەڕ بە هەموو ئایەتو فەرموودەکان بێنین‌و نابێت لە بەرانبەریاندا بڕیاری هەوایی دەربکەینو بەبێ زانستو زانیاری قسە بکەین، بەڵکو دەبێت ڕێی زانستیانەو دادپەروەرانە بگرینەبەر، کە خۆی لە شوێنکەوتنی قورئانو سوننەتدا بەرجەستە دەکات، بەڵام کەسێك دەست بە بەشێکی هەقەوە بگرێتو بەشەکەی تر فەرامۆش بکات، ئەمە کانگەی پەرتەوازەییو ناکۆکیو ناتەباییە.[2]

ز ـ (عبدالعزيز بن باز) دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە فەرموودەکەی (عمار)دا فەرمووی: ((تقتل عمار الفئة الباغية))، جا بەو پێیەی (معاويە)و هاوەڵانی لە جەنگی (صفين)دا کوشتیان، کەواتە (معاويە)و هاوەڵانی یاخی (باغ) بوون، بەڵام موجتەهید بوونو وایانزانی لە داواکاری تۆڵەی خوێنی عوسماندا پێکاویانە.[3]

ح ـ (سعيد حوى) دەڵێت: ژمارەیەك دەق (ی فەرموودە) لەسەر (عەممار) هاتبوونو بە ڕاشکاوی دەڵێن: تاقمە یاخیەکە دەیکوژن، ئیدی پاش ئەوەی (عەممار) کوژرا، خەڵکانی گوماندارو دوودڵ بۆیان ساغ بۆوە کە (عەلی) لەسەر هەقەو هاریکاریکردنی لە جەنگدا واجبە، لەبەر ئەمە (عبدالله ی کوڕی عومەر) پەرۆشیو خەفەتی خۆی لە بەرانبەر ئەم دواکەوتنەیدا دەربڕیوە، تەنها لەبەر ئەوە واجبێکی ئەنجام نەداوە، ئیمامی هەقی بەسەر سەرپێچیکارە ناهەقەکانیدا سەر نەخستووە، زانایانیش بەم شێوەیە فتوایان لەسەر داوە.[4]

---

١ مجموع الفتاوى (٤/٤٣٧).

٢ مجموع الفتاوى (٤/٤٤٩، ٤٥٠).

٣ فتاوى ومقالات متنوعة (٦/٨٧).

٤ الاساس في السنة (٤/١٧١٠).

*** بەرپەرچدانەوەی قسەکەی (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت): هەر ئەو کەسە کوشتوویەتی کە هێناویەتی:**[1]

زۆرینەی هاوەڵان و شوێنکەوتووانیان بە ڕاست و دروستی لە فەرموودەکەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) کە بە (عەممار)ی فەرمووە: ((تقتلك الفئة الباغية))[2] تێگەیشتوون و تێگەیشتوون و وتوویانە کە مەبەست لە تاقمە یاخیەکە: سوپاکەی (معاویە) بوو (خودا لێی ڕازی بێت)، ئەمە لەگەڵ ئەوەدا لە ئیجتیهادەکەیاندا مەبەستیان هەق بووە، بەڵام بە هەڵە چوون و نەیانپێکاوە و پاساویان بۆ دەهێنرێتەوە، کۆمەڵەکەی (عەلی) بە گوێرەی فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) لە هەقەوە نزیکتر بوون،[3] هەرچەندە ئیمامەکان تەئویلەکەی (معاویە) ناخەنە تەرازووەوە و پێی سەرسام نین، (وەك لەمەودوا قسەکانیان دەخەمەڕوو) بەڵام ئەوان لەم ئیجتیهادەیدا پاساوی بۆ دەهێننەوە، ئەوە (إبن حجر)ە سەبارەت بە وتەکەی پێغەمبەری خودا (ﷺ): ((يدعوهم الى الجنة ويدعونهم الى النار))[4] واتە: بانگیان دەکات بۆ بەهەشت و بانگی دەکەن بۆ دۆزەخ، دەڵێت: ئەگەر بوترێت: ئەو لەگەڵ (عەلی) بووە و لە (صفين) کوژراوە، ئەوانەی کوشتوویانە لەگەڵ (معاویە) بوون، (معاویە)ش کۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خودا (ﷺ)ی لەگەڵ بوون، جا چۆن جائیزە بانگەشەکردنی خەڵك بۆ دۆزەخ بخرێتە پاڵ ئەوان؟ وەڵام: ئەوان موجتەهیدبوون و پێیان وابوو خەڵك بەرەو بەهەشت بانگ دەکەن، لەسەر بەدواکەوتنی بیروبۆچوونە ئیجتیهادیەکەیان سەرزەنشت ناکرێن و ڕەخنەیان لێ ناگیرێت، مەبەستیش لە (بانگهێشتکردن بەرەو بەهەشت)یش بانگهێشتکردنی خەڵکە بۆ هۆکارێك کە خەڵك بەرەو بەهەشت دەبات، ئەویش خۆی لە گوێڕایەڵی فەرمانبەرداریکردنی (ئیمام)دا دەبینێتەوە.

بە هەمان شێوە سەبارەت بەو لێکدانەوە و حاڵی بوونەشیان کە بۆ ئەوان ئاوا ڕوون ببۆوە بەهانەیان دەخرێتە دەست.[5]

(قُرطبي) دەڵێت: پێشەوا (أبو المعالي) لە کتێبی (الإرشاد)دا دەڵێت: (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) ئیمامی هەق بوو و بە هەق کرابووە سەرپەرشتیکاری کاروباری موسڵمانان، ئەوانەی لە دژی ڕاست بوونەوە و جەنگیان لەگەڵ کرد یاخی (بغاة)ن، هەرچەندە لە

---

١ مسند أحمد (٢/٢٠٦) إسناده حسن.
٢ مسلم (رقم: ٢٩١٦).
٣ (معاوية) بن أبي سفيان (ص: ٢١٠، ٢١٤).
٤ البخاري (رقم: ٤٤٧).
٥ فتح الباري (١/٦٤٥).

هەڵەدابوون، بەڵام چاك وایە گومانی باشیان پێ بەرین‌و مەبەستی خێرو چاكەیان بۆ لە نەزەر بگرین.[1]

هەروەها دەڵێت: (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) وەڵامی قسەكەی (معاویە)ی بەم جۆرە دایەوەو وتی: (ئەگەر ئاوا بێت، كەواتە پێغەمبەری خوداش (ﷺ) (هەمزە)ی كوشتووە، چونكە ئەو لەگەڵ خۆیدا بردبووی بۆ دەرەوە)، پێشەوا (حافظ أبو الخطاب إبن دحیة) دەڵێت: ئەم قسەیە لە لایەن (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت)ەوە وەڵام نەبوو بەڵكو بەرپەرچدانەوەو دەمكوت كردن بوو، بەڵگەیەك بوو كە كەس ناتوانێت لە بەرانبەریدا بوەستێتەوە.[2]

(إبن كثیر) دەڵێت: ئەم وتەیەی (معاویە) كە دەڵێت: (هەر ئەو كەسە كوشتوویەتی كە هێناویەتیە بەردەمی شمشێرەكانی ئێمە)، ئەمە تەئویلێكی زۆر دوورە، چونكە ئەگەر ئاوابێت، كەواتە: سەركردەی سوپاش دەبێتە قاتیل‌و بكوژی ئەوانەی لە ڕێی خودادا دەكوژرێن، ئەمە بە حوكمی ئەوە ئەو بەرەو بەردەم شمشێری دوژمنانی بردوون.[3]

- (إبن تیمیة) دەڵێت: نازانم كەسێك لە هاوەڵانی چوار ئیمامەكان‌و زانایانی تری هاوێنەیان لە ئەهلی سوننە قسەیەكی لەم جۆرەیان هەبێت، بەڵام ئەمە قسەو بیروبۆچوونی زۆرینەی (مەڕوانیە)كان‌و هاوشێوەكانیانە.[4]

- (إبن القیم) لەسەر ئەم (تەئویلە) قسە دەكات‌و دەڵێت: چاكترین تەئویلی ناهەق تەئویلەكەی خەڵكی (شام) بوو، بۆ فەرموودەكەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) كە دەرهەق بە (عەممار) فەرمووی: ((تقتلك الفئة الباغیة))[5] و وتیان: (ئێمە نەمانكوشتووە، بەڵكو هەر ئەو كەسانە كوشتوویانە كە هێناویانەو كردوویانە بە نیشانەی ڕمبەكانمان)، ئەمە واتاكردنێكی نادروستەو پێچەوانەی ناوەڕۆك‌و واتای دیاری وشەیە: چونكە ئەو كەسە كوشتوویەتی كە ڕاستەوخۆ كوشتوویەتی، نەك ئەو كەسەی پشتی خۆی پێ بەستووە.[6]

---

١ التذكرة (٢/٢٢٢).

٢ التذكرة (٢/٢٢٣).

٣ البداية والنهاية (٦/٢٢١).

٤ منهاج السنة (٤/٤٠٦).

٥ مسلم (رقم: ٢٩١٦).

٦ الصواعق المرسلة (١/١٨٤، ١٨٥).

**٦ــ بکوژی (عەمماری کوڕی یاسر) کێ بوو؟**

(ئەبو غادیەی جوهەنی)ی بکوژی (عەممار) دەربارەی چۆنیەتی کوشتنی عەممار دەڵێت: ڕۆژی جەنگی (صفین)، پیاوێك بە پیادە پێش کەتیبە کەوتبوو دەهاتو دەچوو، تا کەوتە نێوان دوو ڕیزی سوپاوە، پیاوێك سێرەی لێ گرتو ڕمبێکی لە کلاونەژێری گرتو خستیە زەوی، چوومە سەرسەریو بە شمشێر سەرم لێ کردەوە، کە سەرم بەرز کردەوە دەبینم ئەوە (عەممار)ە (ڕاوی دەڵێت): ئەمجا (ئەبو غادیە) (عەممار)ی کوشت، داوای ئاوی خواردنەوەی کرد، ئاوەکەیان لە بەرداخێکی شوشەدا بۆ هێنا، نەیخواردەوە، ئەمجا چوون ئاویان لە قاپیلکەیەکدا بۆ هێنا، ئەویش خواردیەوە، پیاوێك وتی: پارێز لە خواردنەوەی ئاوی نێو شوشە دەکات، بەڵام پارێز لە کوشتنی (عەممار) ناکات.[١]

- (عەمروی کوڕی عاص) (خودا لێی ڕازی بێت) هەواڵ دەداتو دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بوو دەیفەرموو: (قاتل عمار وسالبه في النار)[٢] واتە: بکوژو تالانکەری کەلوپەلەکەی (عەممار) لە دۆزەخە.
- (إبن كثير) دەڵێت: زانراوە کە (عەممار) لە جەنگی (صەفین)دا لە ڕیزی سوپای (عەلی)دا بووە، لایەنگرە شامیەکانی (معاویە) کوشتیان، ئەو کەسەی سەرپەرشتی کوشتنەکەی کرد، پێی دەوترا: (ئەبو غادیە)، پیرەپیاوێکی خەڕەفاو بوو، دەشوترێت هاوەڵ بووە.[٣]
- (إبن حجر) دەڵێت: بۆچوونی باش بەرانبەر بە هاوەڵان لەم جەنگانەدا ئەوەیە: ئەوان لێکدانەوەیان کردووە، هەر موجتەهیدێکیش لە ڕاکەیدا هەڵە بوو پاداشتێکی بۆ دەنووسرێت، ئەگەر ئەم بنەمایە بۆ تاك تاکی خەڵك جێگیر بێت، ئەوا بە باشترین شێواز بۆ هاوەڵان دەچەسپێت.[٤]
- (الذهبي) دەڵێت: بە ڕاوبۆچوونی ڕافیزە: (عبدالرحمن ی کوڕی مەلجەم)ی بکوژی عەلی بەدبەختترین کەسە لە دوارۆژدا، بە ڕاوبۆچوونی ئێمەی ئەهلی (سوننەت) ئومێدەوارین دۆزەخی بێت، بە پێچەوانەی (خەواریجو ڕافیزە) بە دروستیشی دادەنێن خودا بیبەخشێت، حوکمی (عبدالرحمن)، هەمان حوکمی بکوژەکانی (عوسمان، زوبێر، تەڵحە، سەعیدی کوڕی

---

١ الطبقات الكبرى (٣/٢٦٠، ٢٦١).

٢ السلسلة الصحيحة (٥/١٨، ١٩).

٣ البداية والنهاية (٦/٢٢٠).

٤ الإصابة (٧/٢٦٠).

جوبەیر، عەممار، خارجە، حوسێن)ی هەیە، حاشا لە هەموو ئەم قاتیلانە دەکەین‌و لەبەر خاتری خودا ڕقمان لێ دەبنەوەو خۆیان‌و تاوانەکانیان حەواڵەی خودای (عز وجل) دەکەین.[١]

(ئەلبانی) لەسەر قسەکەی (إبن حجر) دەڵێت: ئەمە ڕاستە، بەڵام چەسپاندندنی بەسەر هەر تاکێك لە تاکەکانیدا دژوارە، چونکە وێنەی فەرموودەی: ((قاتل عمار وسالبه في النار)) دەتوانێت بنەما باسکراوەکە هەڵوەشێنێتەوە،[٢] ئیدی ناگونجێت بوترێت: (أبو غادیە)ی بکوژی (عەممار) بە حوکمی ئەوەی بە ئیجتیهاد کوشتوویەتی پاداشتی بۆ نووسراوە، ئەوە پێغەمبەری خودایە (ﷺ) دەفەرمووێت: (بکوژەکەی عەممار لە ئاگردایە)، کەواتە چاك وایە بوترێت: بنەما (قاعدة)کە تا ئەو کاتە بەڵگەیەکی بنەڕەتی لە دژ ڕاست دەبێتەوە بە ڕاست دادەنرێت، ئەگەر بەڵگە پەیدا بوو هەڵواردن دروست دەبێت، وەکو چۆن لێرەدا دروست بوو، بەڵگە هێنانەوە بە نموونەی فەرموودەی (صحیح) لەسەری باشترین شتە.[٣]

(إبن عبدالبر) (ئەبو غادیەی جوهەنی) ناساندووەو دەڵێت: ڕای جیاواز لەسەر ناوەکەی هەیە، وتراوە: (یەساری کوڕی سەبوع)ە، دەشوترێت: (یەساری کوڕی ئەزهەر)ە، یان دەڵێن: ناوی (موسلیم)ە، لە (شام) نیشتەجێ بوو، پاشان هاتە (واسیط)، بە شامی دەژمێردرێت، بە منداڵی بە پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتووە، فەرموودەی لێوە گێڕاوەتەوە، بۆ خۆی دەڵێت: مێردمنداڵ بووم‌و مەڕو بزنم بۆ کەس‌و کارم دەگێڕانەوە، بە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتم، گوێی لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بووە کە فەرموویەتی: ((لا ترجعوا بعدي كفاراً، يضرب بعضكم رقاب بعض))[٤] نەکەن دوای من بگەڕێنەوە سەر حاڵەتی کوفرو لە گەردنی یەکتر بدەن. زۆری (عوسمان) خۆش دەویست، بوو بە قاتیلی (عەمماری کوڕی یاسر)، هەر جارێك دەربارەی چۆنیەتی کوشتنی (عەممار) پرسیاریان لێ کردبایە، بێ سڵەمینەوەو تەزو بە بەدەندا هاتن باسی دەکرد، بەسەرهاتی (ئەبو غادیەو کوشتنی عەممار) بە لای زانایانەوە جێی سرنج‌و سەرسوڕمانە.[٥]

---

١ تاريخ الاسلام، عهد الخلفاء الراشدين (ص: ٦٥٤).

٢ السلسلة الصحيحة (١٨/٥، ١٩).

٣ السلسلة الصحيحة (١٨/٥، ١٩).

٤ مسند أحمد (٧٦/٤)، سنده حسن.

٥ الاستيعاب في معرفة الأصحاب (رقم: ٣٠٨٩).

**٧ــ هەڵسوکەوتی بەخشندانە لە (صفین)دا:**

(صەفین) سەرسوڕهێنەرترین ڕووداوی نێو ڕستە ڕووداوی مێژووی موسڵمانانە، کاتێك مرۆڤ ڕووداوەکانی نێو واقیعەکە دەخوێنێتەوە، بە هۆی ناوازەبوونی لە ڕادەبەدەری، وای لێ دێ بەقا نەکاتو لە بەرانبەر سروشتی ناخی خەڵکانی هەردوولادا سەرسام بێتو مۆڵەق ڕاوەستێ، واقیعەکە بەم جۆرەیە: هەر سەربازێك بە خۆیو شمشێری ڕوتو بڕندەی لەنێوەڕاستی گۆڕەپانی جەنگ وەستاوە، بەبێ ئەوەی لە لایەن سەرکردایەتیەکەی خۆیەوە ڕەشبگیر کرابێتو بە تۆبزی بۆ ئەوێ هێنرابێت، باوەڕی تەواوی بە مەسەلەکەی خۆیەتی، بەڵکو خودی جەنگەکەو سوپا سەرکردایەتی بەڕێوەی دەبات، جەنگێکی زۆر تاقانەیە: لەوەدا کە چ شتێك هەڵی ناوەو هێناویەتیە ئاراوەو لەو پێڕەوی ئەدای دەکاتو لەو شوێنەوارەش لە دوای خۆی بەجێی دێڵێ.

سەرچاوەکانی مێژوو هەندێك هەڵوێستی ئامادەبووانی (صەفین)مان بۆ باس دەکەن، کە کتومتو وەکو خۆی وێنای ناخیان دەکەنو نێتو نیازی ڕاستەقینەی ئەوانمان نیشان دەدەن، ئەوان برانو وێکڕاو بە قەرەباڵغی دەچنە سەر جۆگایەکەو پێکەوە ئاو هەڵدێنچنو ئاو دەخۆنەوەو کەسیش ئازاری کەس نادات.[١] هەر کاتێك جەنگ دەوەستێنرێت برایانەو بە تەبایی پێکەوە دەژین، یەکێك لە بەشداربووان دەڵێت: ئێمە هەر جارێك وازمان لە کوشتار دەهێنا، سەربازانی ئەولا دەهاتنە سەربازگەی ئەمبەرو سەربازانی ئەملاش دەچوونە سەربازگەی ئەوبەر..... قسەمان لەگەڵ دەکردنو قسەیان لەگەڵ دەکردین.[٢] گەنجانی تاکە هۆزێك بەسەر دولادا دابەش ببوون، هەر بەشەیان خاوەن بیروبۆچوونو ئیجتیهادی خۆی بوو، هەر کەسە لە لای خۆیەوە بە توندی شەڕی لەگەڵ خزمانی ئەوبەری دەکرد،[٣] هەر یەکێك لەو دوو لایەنە خۆی بە خاوەن هەق دەزانیو ئامادەبوو لە پێناویدا خۆی بە کوشت دا، دوو پیاو شەڕیان لەگەڵ یەکتر دەکرد، یەکتریان شپرزە دەکرد، بریندار دەکرد، بۆ پشودان دادەنیشتن، مشتومڕێکی باشیشیان دەکرد، ئەمجا لێکتر ڕاست دەبوونەوەو وەکو پێشدا لێکتریان دەدایەوە.[٤] ئەوان ڕۆڵەی ئوممەتێك بوون، ئاینێك کۆی کردبوونەوە کە لە

---

١ تاريخ الطبري (٥/٦١٠)، سير أعلام النبلاء (٢/٤١)، مرويات أبي مخنف (ص: ٩٦).

٢ البداية والنهاية (٧/٢٧٠)، دراسات في عهد النبوة (ص: ٤٢٣).

٣ تاريخ الطبري، نقلاً عن دراسات في عهد النبوة (ص: ٤٢٤).

٤ البداية والنهاية (١٠/٢٧٢).

خۆیان خۆشتر دەویست، هەر کە کاتی نوێژ دەهات، وازیان لە جەنگ دێناو دەچوون نوێژەکەیان دەکرد.[1] ئەو ڕۆژەی کە (عەممار) کوژرا، هەردوو لایان نوێژیان لەسەر کرد.[2]

شایەدعەیانێکی بەشداربووی (صەفین) باس دەکات:

لە (صەفین) بارگەمان خست، ڕۆژانێکی زۆر جەنگمان کرد، خەڵکێکی زۆر لەو نێوانەدا کوژران، تا ئەوەی وڵاخە بەرزەکان شپرزە ببوون‌و جەنەیان دەگرت، (عەلی) وەڵامی بۆ (عەمروی کوڕی عاص) نارد: کوژراوێکی زۆری هەیە، با جارێك شەڕ ڕاگرین تا هەردوولا کوژراوەکانمان دەنێژین، ئەویش وەڵامی بە ئەرێ دایەوە، خەڵکی هەردوولا بەم شێوەیە چۆن پەنجەی دەست دەچنە نێو یەکترەوە، ئاوا تێکەڵی یەکتر بوون، لە نێو هاوەڵانی (عەلی)دا هی وا هەبوو خۆی بەنێوجەرگەی سەربازگەی (معاویە)دا دەکرد، دەستی بە کوشتار دەکردو لە لایەکەوە دەهاتە دەرەوە، تاقمەیەك لە هاوەڵانی (عەلی) بە خۆیان‌و تەرمی کوژراوێکیانەوە بە تەك (عەمرو)دا ڕادەبوورن، کە (عەمرو) کوژراوەکەی بینی گریاو وتی: موجتەهید بووەو لە جێبەجێکردنی فەرمانی خودادا توندو تۆڵ‌و چالاك بووە.[3] ئەوان لەم جۆرە شوێنانەشدا بەریان بە خراپە دەگرت‌و لەم ڕێیەدا پێشبڕکەیان دەکرد، ئەو تاقمەی بە (قوڕاء) ناسرابوون‌و لە شاگردانی (عبدالله ی کوڕی مەسعود) بوون‌و لە خەڵکانی شام‌و عێراق پێکهاتبوون، نە تێکەڵ بە سوپای (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران بوون، نە تێکەڵ بە سوپای (معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان) بوون، بە (ئەمیری ئیمانداران)یان وت: ئێمە لەگەڵتان دەردەچین، بەڵام لە سەربازگەکەتان دانانیشین، بەڵکو لە شوێنێکی بەرانبەر سەربازگەکەی ئێوەو سەربازگەکەی شام قەرار دەگرین‌و چاودێری هەردوولاتان دەکەین، هەر کەسێکمان لە ئێوە یان لەوان بینی کارێك دەکات حەڵاڵ نیە، یان ستەمێکی لێ ڕوو دەدات ئێمە لە دژی دەوەستین، (عەلی) وتی: (مرحباً وأهلاً) یاخوا بەخێر بێن، ئەمە تێگەیشتنە لە دین‌و شارەزابوونە لە (سوننەت)، کێ بەمە ڕازی نەبێت ئەوە ستەمکارو خیانەتکارە.[4] لە ڕاستیدا هەموو ئەو هەڵوێستانە بەرهەمی چەند قەناعەت‌و ئیجتیهادێکیان بوون‌و بەوپەڕی باوەڕو متمانەی تەواوەوە لە پێناویاندا جەنگان.[5]

---

١ تاريخ الطبري، نقلاً عن دراسات في عهد النبوة (ص: ٤٢٤).

٢ تاريخ دمشق (٢٣٣/٨)، دراسات في عهد النبوة (ص: ٤٢٤).

٣ أنساب الأشراف (٥٦/٦) بسند حسن.

٤ صفين (ص: ١١٥)، دراسات في عهد النبوة (ص:٤٢٤).

٥ دراسات في عهد النبوة (ص:٤٢٤).

**٨ــ ڕەفتاری (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران لە بەرانبەر دیلەکاندا:**

پاش ئەوەی ئەو هەموو هەڵوێستە جوامێرانەمان خستنەڕوو کە لە کاتەکانی جەنگدا نوێنراون، کەواتە شتێکی بەڵگە نەویستە کە گیراوانی جەنگەکە بەوپەڕی ڕێزو حورمەتەوە ڕەفتاریان لەگەڵ کرابێت، خۆ ئیسلام بابەتی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ دیلی بە جوانی ڕوونکردۆتەوە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) هانی هاوەڵانی داوە ڕێز لە دیلکراوان بگرن‌و باشترین جۆر خواردنیان پێ بدەن، ئەمە بە نیسبەت دیلانی ناموسڵمانەوەیە، ئەی ئەگەر دیلەکان موسڵمان بوون؟ بێگومان دەبێ ڕێزلێنان‌و چاکە لەگەڵ نواندنیان باشتر بێت، بەڵام دیلی ئەم جەنگە بە هێزو وزەو توانای لایەنەکەی دادەنرێت،[1] لەبەر ئەوە (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) فەرمانی بەندکردنی بۆ دەدا، ئەگەر بەیعەتی پێ دابایە ئازادی دەکردو ئەگەر قبوڵی نەکردبایە چەك‌و وڵاخەکەی لێ دەستاند، یان دەیدایەوە بە خۆی‌و سوێندی دەدا جارێکی تر جەنگی لە دژ نەکاتەوە، لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێت: چوار درهەمی پێ دەدا.[2] لێرەدا مەبەستی خەلیفەی ڕاشیدو سەرڕاست‌و ڕوونە، کە بریتیە لە: لاوازکردنی بەرەی یاخی‌و لە فەرمان دەرچوو.

ڕۆژی (صفین) دیلێکیان بۆ لا هێنا، کابرای دیل وتی: بە کوشتنی لەسەرەخۆ مەمکوژە (و ئەگەر دەمکوژی خێرا لە یەخەم کەوە)!، (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) وتی: بە کوشتنی لەسەرەخۆ ناتکوژم، من لە خودای جیهانیەکان دەترسم، ئازادی کردو ئەمجا پێی وت: هیچ خێرو بێرێکت پێوەیە بەیعەت بدەی؟[3]، بە گوێرەی ئەم ڕیوایەتانە هەڵسوکەوتی (عەلی) لە بەرانبەر دیلەکاندا بەم جۆرە بووە:

- ڕێزگرتن‌و چاکەکردن لەگەڵ دیلدا.
- پێشنیاری بەیعەتدان‌و فەرمانبەرداریکردنی بۆ دەکرد، ئەگەر بەیعەتی دابایە، ئازادی دەکرد.
- ئەگەر بەیعەتی نەدابایە، چەکەکەی لێ دەستاندو سوێندی دەدا جارێکی تر نەگەڕێتەوە بۆ جەنگ ئەمجا ئازادی دەکرد.

---

١ الحاوي الكبير- كتاب قتال أهل البغي (ص: ١٣٣، ١٣٤).

٢ خلافة علي بن أبي طالب، عبدالحميد (ص: ٢٤٣).

٣ الأم، الشافعي (٢٢٤/٤)، (٢٥٦/٨).

● ئەگەر هەر جەنگی بویستایە، بە دیلی دەیهێشتەوەو بە کوشتنی لەسەرەخۆش نەیدەکوشت.[١]

جارێکیان (١٥) دیلیان بۆ لا هێنان (پێ دەچێت بریندار بووبن)، هەر یەکێك لەوان بمردایە دەیشۆریو کفنی دەکردو نوێژی لەسەر دەخوێند.[٢]

(محي الدين الخطيب) قسە لەسەر ئەم جەنگە دەکاتو دەڵێت: وێڕای ئەمە، ئەم جەنگە نموونەییە، یەکەمین جەنگە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا ڕوویداتو هەردووك لایەنی جەنگاوەر لەسەر بنەماکانی ڕەوشت بەرزیو چاك ڕەفتاری لەگەڵ یەکتر بەشەڕ بێن، خۆزگە حوکمڕانانی خۆرئاوا لە جەنگەکانی خۆیاندا ئەگەر لە سەدەی بیستو یەکەمیشدا بووایە پێڕەویان لێکردبایە، ئەگەر ئەم جەنگە ڕووی نەدابایە ئەوا زۆرێك لە بنەماکانی (جەنگ) لە ئیسلامدا نەدەزانرانو نەدەنووسرانەوە، بێگومان هەر شتێك خودا حیکمەتێکی خۆی تێدا داناوە.[٣]

(إبن العديم) دەڵێت: گوتم: ئەمە هەر هەمووی حوکمی خەڵکانی یاخیو سەرپێچیکار(ی ئیمامە)، لەبەر ئەمە (أبو حنيفە) وتوویەتی: ئەگەر (عەلی) بە کردار ڕەفتاری لەگەڵ نەکردبانایە، ئەوا کەسێك نەیدەزانی چۆنو بە چ شێوازێك هەڵوێست لە بەرانبەریاندا وەردەگیرێت.[٤]

**٩ـــ ژمارەی کوژراوان:**

زانایان لەسەر ژمارەی کوژراوان زۆر لێك جیاوازن، (أبو خیثمة) دەڵێت: ژمارەی کوژراوانی (صفين) گەیشتۆتە حەفتار هەزار، (٢٥) هەزار لە خەڵکی عێراقو (٤٥) هەزار لە خەڵکی شام.[٥] (إبن القيم) دەڵێت: ژمارەی کوژراوانی (صفين) گەیشتۆتە حەفتا هەزار یان کەمێك زیاتر لەمە.[٦]

---

١ خلافة علي بن أبي طالب، عبدالحميد (ص: ٢٤٣).
٢ تاريخ دمشق، تحقيق: المنجد (١/٣٣١)، خلافة علي (ص: ٢٤٣).
٣ العواصم من القواصم (ص: ١٦٨، ١٦٩)، من تعليق الخطيب في الحاشية.
٤ بغية الطالب في تاريخ حلب (١/٣٠٩)، خلافة علي بن أبي طالب، عبدالحميد (ص: ٢٤٥).
٥ الانباء للقضاعي (ص: ٥٩)، خلافة علي (ص: ٢٤٥).
٦ الصواعق المرسلة (١/٣٧٧) بدون سند، تحقيق: محمد دخيل الله.

بێگومـان ئـەم ژمارانـە خـەیاڵین‌و ناڕاسـتن، چـونکە جـەنگی گـەورەو پێکهەڵـشاخانی دەستەجەمعی تەنها سێ ڕۆژ درێژەی کێشاوە، جگـە لـە شـەوی هـەینی، هـەموو شـەوەکان شەڕیان وەستاندووە، کۆی گشتی جەنگەکە تەنها خۆی لە (٣٠) سەعات دەدا.[١]

هەرچەندە شەڕەکە توند بووبێت، ئـەوا نەگەیشتۆتە توندی شـەڕەکەی (قادسیە) کـە ژمارەی شەهیدەکانی (٨٥٠٠) هەشت هەزارو پێنج کـەس بـووە.[٢] کەواتـە لـە ڕووی ئەقڵـەوە شتێکی قورسە ئەو ڕیوایەتانە قبوڵ بکەین کە ئەو ژمارە زۆرانە دادەنێن.

**١٠ــ بەسەرکردنەوەی کوژراوەکان لە لایەن ئەمیری ئیمانداڕانەوەو دەربڕینـی پەرۆشـی خۆی بۆیان:**

دوابــەدوای ئەنجامــدانی چــالاکیە جەنگیــەکان، (عــەلی) ئــەمیری ئیمانــداران بەســەر کوژراوەکانــدا دەگــەڕا، شـایەتعەیانێك دەبێـژێت: (عـەلی)م بینـی بـە سـواری ئێـسترەکەی پێغەمبــەر (ﷺ) کــە نــاوی (شــهباء) بــوو بــەنێو کوژراوەکانــدا دەگــەڕا،[٣] لــە کــاتی بەسەرکردنەوەی کوژراوەکان (ئەشتەر)ی لەگەڵدا بوو، بە پەنا کوژراوێکدا ڕابورد کـە قـازی‌و خواپەرستێکی بەناوبانگی (شام) بوو، (ئەشتەر)، لە ڕیوایەتێکی تردا (عەدی کـوڕی حاتـەم) وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران: ئـەوە (حـابس)[٤] نـەبوو لەگـەڵیان؟. بـە خـودا دەمناسـی ئـەو ئیماندار بوو، (عەلی) وتـی: ئـەمڕۆش ئیمانـدارە، لەوانەیـە ئـەم پیـاوە کـوژراوە ئـەو قازیـەی دیمەشـق بێـت کـە هاتـە لای (عومـەری کـوڕی خـەتتاب)و وتـی: ئـەی ئـەمیری ئیمانـداران: خـەونێکم بینیـوە، تۆقانـدوومی، وتـی: چیە؟ وتـی: خـۆرو مـانگم بینـی شـەڕیان دەکـرد، هەریەکەیان نیوەی ئەستێرەکانی لەگەڵ بوون، وتی: تۆ لەگەڵ کامیـان بـووی: وتـی: لەگـەڵ مانگ بووم‌و لە دژی خـۆر بـووم، (عومـەر) وتـی: خـودای بـەرز دەفـەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ءَايَتَيْنِ ۖ فَمَحَوْنَآ ءَايَةَ ٱلَّيْلِ وَجَعَلْنَآ ءَايَةَ ٱلنَّهَارِ مُبْصِرَةً﴾[٥] واتە: مـانگ‌و ڕخۆرمـان کـردوون بـە دوو نیـشانە ، نیـشانەی مانگمـان کوژاندۆتـەوەو (مەیلـەو تاریکـە) ، نیـشانەی خۆرمـان بەشۆقکردوە (ڕووناکە).

---

١ الدولة الأموية (ص: ٣٦٠، ٣٦٢).

٢ تاريخ الطبري (٤/٣٨٨).

٣ مصنف إبن أبي شيبة.

٤ ناوی تەواوی: حابسی کوڕی طائي (مخضرم)، لە (صەفین) کوژراوە.

٥ الاسراء (١٢).

هەستە لێرە بڕۆ، بە خودا هەرگیز کاری ئێمە بەڕێوە نابەی، ڕاوی دەڵێت: هەواڵم پێ گەیشتووە کە لە (صفین) لەگەڵ (معاویە)دا بووەو کوژراوە.[1]

(عەلی) لە بەرانبەر کوژراوەکانی خۆیو کوژراوەکانی (معاویە) ڕاوەستاو وتی: خودا لێتان خۆش بێت، خودا لێتان خۆش بێت، خودا لە هەردوولا بە تێکڕا خۆش ببێت.[2]

لە (یەزیدی کوڕی ئەصەم)ەوە، وتی: کاتێك (صوڵح) لە نێوان (عەلی)و (معاویە)دا کرا، (عەلی) چووە دەرەوەو بەنێو کوژراوەکانی خۆیدا ڕۆیشتو وتی: ئەمانە لە بەهەشتن، ئەمجا چووە نێو کوژراوەکانی (معاویە)و وتی: ئەمانە لە بەهەشتن، کاروبار(ی لێپرسینەوە)ەکە ڕووبەڕووی منو معاویە دەکرێتەوە.[3]

دەربارەی ئەوان دەیوت: ئەوانە ئیماندارن.[4] قسەو بیروڕاکانی لە بەرانبەر خەڵکی (صەفین) لەگەڵ ئەو قسەو بیروڕایانەی سەبارەت بە خەڵکی جەنگی (جەمەل) دەری بڕیبوون جیاوازیان نەبوو.[5]

### ١١ـ هەڵوێستێکی (معاویە) لە بەرانبەر شای (ڕۆم)دا:

شای ڕۆم ناتەبایی نێوان (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران و (معاویە)ی بە هەل وەرگرتو بە تەمابوو ڕووبەرێك لە خاکی ژێر فەرمانڕەوایی (معاویە) داگیر بکاتو بیخاتە سەر مەملەکەتی خۆی.

(إبن کثیر) دەڵێت: ... پاش ئەوەی معاویە ترساندبوویو داماوی کردبووو بەسەر سوپاکەیدا زاڵ ببووو شکستی دەرخوارد دابوو، (شای ڕۆم) چاوی بڕیە (خاکی ژێردەستی) معاویە، کاتێك تەماشای کرد (معاویە) بە جەنگی (عەلی)یەوە سەرقاڵ بووە، بە خۆیو سوپایەکی گەورە لەسەر سنوور نزیك بۆوە، (معاویە) هەڕەشەنامەیەکی بۆ ناردو پێی وت: (ئەی نەفرەتلێکراو: سوێند بێت بە خودا ئەگەر واز نەهێنیتو بەرەو وڵاتی خۆت نەکشێیەوە، ئەوا منو ئامۆزاکەم لە دژی تۆ صوڵح دەکەینو لە وڵاتەکەی خۆشت دەرت دەکەمو زەویت بەو بەرفراوانیە لێ تەنگ دەکەمەوە)، ئەلێرەدا شای ڕۆم ترساو وازی هێناو

---

١ مصنف إبن أبي شيبة (١١/٧٤) بسند منقطع.

٢ خلافة علي بن أبي طالب، عبدالحميد (ص: ٢٥٠)، تنزيه لخال المؤمنين.

٣ مصنف إبن أبي شيبة (١٥/٣٠٣) بسند حسن.

٤ تاريخ ودمشق (١/٣٣١، ٣٢٩)، خلافة علي (ص: ٢٥١).

٥ خلافة علي (ص: ٢٥١) تنزيه لخال المؤمنين (ص: ١٦٩).

نوێنەری خۆی ناردو داوای صوڵحی دەکرد.[١] ئەمە دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەوە: کە ئەگەر ئاسایشی دەوڵەتی ئیسلامی (شام) کەوتبایە مەترسیەوە، ئەوا ناکۆکی نێوان (معاویە)و (عەلی) ماوەی چاوترووکانێکیش درێژی نەدەکێشا، خۆ ئەگەر ڕۆمەکان نەیانزانیبایە کە ناکۆکیەکان شایانی چاکبوونەوەو لەبیرچوونەوەن بە تەواوەتی، ئەوا ئەوان هەڕەشەکەی (معاویە)یان بە هەند هەڵنەدەگرتو دەستیان لە داگیرکردن نەدەکێشایەوە.[٢]

### ١٢ــ بەسەرهاتێکی هەڵبەستراو دەرهەق بە (عەمری کوڕی عاص) لە (صەفین)دا:

(نەصری کوڕی موزاحیمی کوفی) وتی: خەڵکی (عێراق) هەڵمەتیان برد، خەڵکی (شام) پێیان هەڵشاخان، پێکیان دادا، (عەمروی کوڕی عاص) هەڵمەتی برد، ......، (عەلی) بەرەنگاری بۆوەو دەیوت: (قد علمت ذات القرون الميل...... والخضر وألأنامل الطفول).... تا ئەوەی دەڵێت: ئەمجا پالّی پێوە ناو بە زەوی دادا، (عەمرو) لینگی بەرزکردەوەو دەیەویست بە قاچەکانی لە خۆی دوور بخاتەوە، عەورەتی دەرکەوت، (عەلی) ڕووی خۆی لێ وەرگێڕاو بە پێکراویو پەشۆکاوی بەجێی هێشت، چەند کەسێك وتیان: پیاوەکە بۆی دەرچوو ئەی ئەمیری ئیمانداران، وتی: ئایا دەزانن ئەوە کێیە؟ وتیان: نا، وتی: ئەوە (عەمروی کوڕی عاص) بوو بە عەورەتی ڕووتیەوە ڕووبەڕووم بۆوە، منیش ڕووی خۆم لێ وەرگێڕا.[٣]

(إبن الكلبي)یش هەمان چیرۆك باس دەکاتو (السهيلي)یش لە (الروض الأنف)دا هێناویەتیو دەڵێت (عەلی) وتی: ئەو بە هۆی دەرخستنی عەورەتیەوە خۆی لێ پاراستمو خزمایەتی خۆیشی بە گژدا کردم، تا ئەوەی ڕاویەکە دەڵێت: .... وێنەی ئەمە سەبارەت بە (عەمروی کوڕی عاص) لەگەڵ (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) لە (صەفین)دا ڕیوایەت کراوە، دەربارەی ئەم (ڕیوایەتە) (حارثی کوڕی نەضری شەهمی) دەڵێت: (إبن الكلبي)و (غەیری ئەویش) ڕیوایەتیان کردووە:

أفي كل يوم فارس غير منته وعورته وسط العجاجة بداية
يكف لها عنه علي سنانه ويضحك منه في الخلاء معاوية[٤]

---

١ البداية والنهاية (٨/١٢٢).
٢ الدور السياسي للصفوة في صدر الاسلام (ص: ٢١١).
٣ وقعة صفين (٤٠٦، ٤٠٨)، قصص لا تثبت، سليمان الخراشي (٦/١٦).
٤ الروض الروض الأنف (٥/٤٦٢)، قصص لا تثبت (٦/١٩).

بەرپەرچدانەوەی ئەم بوختانە بەم شێوەیەیە:

گێڕەرەوەی ڕیوایەتی یەکەم: (نەصری کوڕی موزاحیمی کوفی) خاوەنی (ڕووداوی صەفین)، شیعەیەکی توندو ڕەقە، درۆکردن‌و بوختان هەڵبەستنی بۆ هاوەڵان نامۆ نیە، (الذهبي) لە (المیزان)دا دەربارەی دەڵێت: (نەصری کوڕی موزاحیمی کوفی)ی ڕافیزەیەکی وشک‌و برنگ بوو، لە سەنەدی ڕیوایەتدا تەرکیان کردووەو تووڕیان داوە.

(العقیلي) دەڵێت: شیعەیە، گێڕانەوەکانی تێکەڵ‌و پێکەڵن‌و هەڵەی زۆریان تێدایە، (أبو خیثمة) دەڵێت: ئەو درۆزن بوو.[1]

(إبن حجر) دەربارەی دەڵێت: (العجلي) وتوویەتی: ئەو ڕافیزەیەکی توندڕەو بووە... جێی متمانە نیە.[2]

بەڵام سەبارەت بە (الکلبي) هوشامی کوڕی محمدی کوڕی سائیبی کەلەبی، زانایان یەکدەنگن کە شیعەیەکی توندڕەو بووە.

(ئیمام ئەحمەد) دەڵێت: کێ فەرموودەی لێ ڕیوایەت دەکات؟! گومان نابەم کەس متمانەی پێ بکات‌و لێی بگێڕێتەوە، (الدار قطني) دەڵێت: ئەو مەتروکە.[3]

ئەمەو ئەم چیرۆکە لە ڕێگەی ئەم دوو ڕافیزەوە لە هەموو شوێنێك بڵاو بۆوە، دوای ئەوانیش مێژوونووسە شیعەکان‌و ژمارەیەکیش لەو سوننە مەزەبانەی ئەو جۆرە چیرۆکانەیان لە نێودا بڵاوببۆوە، هەڵیانگرتەوەو هێندەی تر لە نووسینەکانیاندا ڕەواجیان پێدا.[4]

ئەمە نموونەیەکە لە کۆی ئەو بوختانانەی لە لایەن شیعەی ڕافیزەوە بۆ هاوەڵانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) هەڵبەستراون، مێژوونووسانی ڕافیزە، داخلەدڵانی هاوەڵان، بە مەبەستی بڵاوبوونەوەی بوختانەکانیان بە ئاسانترین شێوە لەنێو خەڵکدا، هاتوون بە شێعرو بە چیرۆك سوکایەتیان بەو هاوەڵە جوامێرو ڕێزدارانە (خودا لێیان ڕازی بێت) کردووەو عەیب‌و عاریان خستوونەتە پاڵ. بە خاتری ئەوە ئەهلی سوننە لە گۆڕەپانی لێکۆڵینەوەو ساغکردنەوەی هەواڵو ڕووداوەکانی مێژووی ئیسلام وەدرەنگ کەوتن، کار بەوە گەیشت ئەم چیرۆك‌و شێعرە بوختان ئامێزانە لەنێو خەڵکو حیکایەتخوێنەکاندا پەتاتاسا تەشەنەیان کردو

---

١ میزان الإعتدال (٤/٢٥٣، ٢٥٤).

٢ لسان المیزان (٦/١٥٧).

٣ المجروحین لإبن حبان (٣/٩١)، تذکرة الحفاظ (١/٣٤٣)، معجم الأدباء (١٩/٢٨٧)، قصص لا تثبت (١/١٨).

٤ قصص لا تثبت (١/٢٠).

بە داخەوە بە لای خەڵك‌و مێژوونووسانی ئەهلی (سوننە)شەوە بوونە شتێکی سەلمێنراوو بەڵگەنەویست‌و واقیعی.[١]

**١٣ـ تێپەڕینی (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران بەسەر گۆڕستانی کوژراوانی جەنگەکەدا، لە کاتی گەڕانەوەیدا:**

کاتێك (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران (خودا لێی ڕازی بێت) لە (صەفین) دەگەڕایەوە، بەپەنا چەند گۆڕێکدا تێپەڕی‌و وتی: سڵاوتان لەسەر بێت: ئەی خەڵکی ولاتی تەنهایی‌و چۆڵەوانی، لە ئیمانداران‌و موسڵمانانی ژن‌و پیاو، ئێوە پێش ئێمە ڕۆیشتن، ئێمەش بە دوای ئێوەدا دێین‌و پاش کەمێکی تر دەگەینە کاروانەکەتان، خودایە: لە ئێمەو لە ئەوان خۆش بە، بە لێبوردنی خۆتمان لەگەڵ بکەو چاوپۆشی لە ئێمەو لە ئەوان بکە، سوپاس‌و ستایش بۆ (ألله) کە زەمینی بۆ زیندووان‌و بۆ مردووان کردووە بە لانە، سوپاس‌و ستایش بۆ (ألله) کە لەم زەویە دروستی کردن‌و لەسەر ئەو حەشرتان دەکات‌و لەوێدا دەتانژێنێتەوە، خۆشی بۆ ئەو کەسەی قیامەتی لە یادەو خۆی بۆ لێپرسینەوە سازکردووەو قەناعەت بە ئەوەندە دەکات کە نەمر نەژی پێی دەژی.[٢]

**١٤ـ بکوژانی (عوسمان) (خودا لێی ڕازی بێت) سورن لەسەر درێژەپێدانی جەنگ:**

بکوژەکانی عوسمان بە خاتری لاوازبوونی هەردوو بەرەو، فەرامۆشکرانی چەسپاندنی حوکمی تۆڵە بەسەریاندا، پێداگیریان دەکرد جەنگەکە بەردەوام بێت، بۆیە کاتێك بینیان خەڵکی شام (موصحەف)ەکانیان بەرز کردوونەتەوەو (عەلی)یش (خودا لێی ڕازی بێت) وەڵامی داواکەیانی دانەوەو فەرمانی دا جەنگ بوەستێت‌و چیدیکە خوێن نەڕژێت، لەم کاتەدا بە پەلەو هەڵەداوان چوونە لای (عەلی)و دەیانەویست بڕیارەکەی پێ هەڵوەشێننەوە، بەڵام کار لە کار ترازابووو لە دەستیان دەرچوو: چونکە تازە جەنگ وەستابوو، بۆیە جگە لە جودابوونەوە لە (عەلی)و دەرچوون لە دژی هیچ چارەیەکی تریان دەست نەکەوت، ئیدی دروشمی (الحكم لله)یان داهێناو ڕۆیشتن لە دووری هەردوو بەرەکە خۆیان مەڵاسدا. ئەوەی نامۆ بێت‌و جێی تێوەڕامان بێت مێژوونووسان لەسەر کردارو هەڵوێستی ئەمانە لەم قۆناغەدا نەوەستاون‌و هەڵوێستەیان نەکردووەو نەهاتوون بەراوردێك لە نێوان هەڵوێستەکانیان لە جەنگی (جەمەل) لە لایەکەوەو، هەڵوێستەکانی تریان لە (صفین)دا بکەن، ئەمە لەگەڵ

---

١ المصدر نفسه (١٠/١).

٢ البيان والتبيان للجاحظ (١٤٨/٣)، فرائد الكلام للخلفاء الكرام (ص: ٣٢٧).

ئەوەدا ئەم بکوژانە لەنێو سوپای (عەلی)دا بوونیان هەبوو، نەهاتوون نهێنی خامۆشکردنی وتوویژەکانی ئاشتی نێوان هەردوولا دەربخەن کە ماوەی چەند مانگێك درێژەیان کێشاو ئەو ڕۆڵە کاریگەرانەیان نەخستۆتە ڕوو کە بکوژەکانی (عوسمان) لە (صەفین)دا ولە پێناوی پەکخستنی هەوڵەکانی صوڵحی نێوان هەردوولا دەیانگێڕا، چونکە کاتێك (عەلی)و (معاویە) صوڵح دەکەن، بێگومان صوڵحەکە مەسەلەی (خوێن)یشی تێدایە، ئەقڵ قبوڵی ناکات ئەوانە ئاگری ئاشوبی (جەمەل) خۆش بکەنو لە (صەفین)یش گوێی پێ نەدەن.[1]

**١٥ــ قەدەغەکردنی نەفرینکردن لە معاویەو خەڵکی شام لە لایەن (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداارانەوە:**

ڕیوایەت کراوە: کاتێك (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) هەواڵی پێدرا دوو کەس لە هاوەڵانی قسە بە (معاویە) دەڵێنو نەفرین لە خەڵکی شام دەکەن، وەڵامی بۆ ناردن کە واز لەم گوفتارو کردارەیان بێنن، هاتنە لایو وتیان: ئەی ئەمیری ئیمانداران: ئایا ئێمە لەسەر هەق نینو ئەوانیش لەسەر ناهەق نین؟ وتی: بەڵێ، سوێند بە پەروەردگاری کابەی بەرگکراو، وتیان: ئەی بۆ نایەڵی بەر قسەو نەفرینیان بدەین؟ وتی: حەز ناکەم ئێوە خەڵکانی دەمشڕو نەفرینکەر بن، بەڵام بڵێن: خودایە خوێنی ئێمەو ئەوان هیچکە نەڕژێت، صوڵحیان لەنێواندا بکە، لەو نەفامیەی کە تێی کەوتوون دەریان بێنەو دووریان بخەوە، تاکو هەقو ناهەق لێك جیابکرێتەوەو کێش کەوتۆتە گێژاوی یاخی بوون بێتە دەرو وازی لێ بێنێت.[2]

بەڵام ئەو قسەو قسەلۆکانەی کە دەڵێن:

(عەلی) لە نزای (قنوت)دا نەفرینی لە (معاویەو هاوەڵانی) کردووەو کاتێك (معاویە)ش دوعای قنوتی دەخوێند نەفرینی لە (عەلیو عبدالله ی کوڕی عەباسو حەسەنو حوسێن) کردووە، ئەمە هەواڵێکی ناڕاستەو ڕیوایەتێکی ناصەحیحە، چونکە هاوەڵان (خودا لێیان ڕازی بێت)لە هەر هەموو کەس زیاتر پابەندی فەرمانەکانی شەرع بوون کە ڕێگری کردووە جنێو بە موسڵمان بدرێتو نەفرینی لێ بکرێت،[3] ئەم فەرموودەیە لە پێغەمبەری خودا (ﷺ)ەوە ڕیوایەت کراوە: ((من لعن مؤمناً، فهو كقتله))[4] واتە: هەر کەسێك نەفرەت لە ئیماندارێك بکات، ئەوە وەکو ئەوەیە کوشتبێتی، هەر پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((لیس

١ أحداث وأحاديث فتنة الهرج (ص: ١٤٧).
٢ الأخبار الطوال (ص: ١٦٥)، نقلاً عن تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة (٢/٢٣٢).
٣ تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة (٢/٢٣٢).
٤ البخاري، كتاب الأدب (٧/٨٤).

المـؤمن بطعـان ولا بلعـان))[١] واتـە: ئیمانـدار نـە تـوانجگرە، نـە نەفرینکـەرە، هـەروەها دەفەرمووێت: ((لا یكـون اللعـانون شـفعاءَ ولا شـهداءَ یـوم القیامـة))[٢] واتـە: نەفرینکـەران لـە دوارۆژدا نابنە تکاکارو شایەد.

ئەو ڕیوایەتەش کە دەڵێت: گوایـە: ئـەمیری ئیمانـداران لـە قنوتـدا نـەفرەتی لـە معاویـەو هاوەڵانی کردووەو معاویـەش نـەفرەتی لـە (ئـەمیری ئیمانـدارانو عبـدالله ی کـوڕی عـەباسو حەسەنو حوسێن) کردووە لە لایەنی سەنەدەوە ناجێگیرو نەچەسپاوە، چونکە (أبي مخنف لوطی کوڕی یەحیای ڕافیزی موحتەڕەق)ی تێدایەو ئەویش متمانەی پێ ناکرێتو مەتروکە.

لە صـەحیحترین کتێبـەکانی (شـیعە)شـدا: جنێـودان بـە هـاوەڵان قەدەغـەکراوە، (عـەلی) ڕەخنەی توند ئاڕاستەی ئەوانە دەکات کە قسە بە (معاویە)و هاوەڵەکانی دەڵـێنو ، دەڵێـت: مـن پـێم ناخۆشـە ئێـوە جنێـوفرۆش بـن، بـەڵام ئەگـەر باسـی کردەوەکانیـان بکـەنو ئـەو بارودۆخـەی تێـی کـەوتوون وەکـو خـۆی بیخەنـەڕوو، ئـەوا: قـسەکەتان چـاکتر جێـی خـۆی دەگرێت و بۆچوونەکانیشتان چـاکتر دەبـن، چـاك وایـە لـە جیـاتی قـسەپێگوتنیان ئەمە بڵـێن: خودایە خوێنڕێژی نێوانمان بوەستێنە، ئاشـتی لـە نێـوان ئێمـەو ئەوانـدا بکـەیتو ئاشـتمان بکەیتەوە.[٣] بـە دانپێـداهێنانی صـەحیحترین کتێبـی (شـیعە) جنێـودانو تـەکفیر کـردن ڕێو ڕەوشتی عەلی نەبووە.[٤]

## چوارەم: تەحکیم (نێوبژیوانی):

دوابەدوای کۆتـایی پێهێنـانی جـەنگی (صـفین)، هـەردوو لایـەن لەسـەر (تـەحکیم)–واتـە نێوبژیوانی و میانگیری– ڕێککەوتن، کە بریتیـە لـەوە: هـەر کـام لـە عـەلیو (معاویـە) سـەرو کەسێك لە لایەن خۆیانەوە بۆ نابژیوانی هەڵبژێرنو ئەمجا هەردوو ناوبژیوان (حەکەم)ەکە بـە گوێرەی خواستو بەرژەوەنـدی موسـڵمانان ڕێککـەون، (معاویـە) (عـەمروی کـوڕی عـاص)ی داناو (عەلی)یش (ئەبو موسای ئەشعەری) دانا خوا لە هەر هەموویان ڕازی بێ، ئیدی هـەردوو ناوبژیوان لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٣٧ی کۆچی لە شوێنێك کە پێی دەوتـرا (دومـة الجنـدل)

---

١ السلسلة الصحيحة للألباني (رقم: ٣٢٠)، صحيح سنن الترمذي (١٨٩/٢)، (رقم: ١١١٠).
٢ مسلم (٢٠٠٦/٤)، (رقم: ٢٥٩٨).
٣ نهج البلاغة (٣٣٢).
٤ أصول مذهب الشيعة (٩٣٤/٢).

کۆبوونەوەو دەرەنجام ڕێککەوتننامەیەك لـە نێـوان هـەردوولا سـەبارەت بەمـە نووسـرایەوەو ئیمزا کرا.

بەشێك لە سوپاکەی عەلی (خودا لێی ڕازی بێت) پێیان وابوو عـەلی بـەم کـارەی تـاوانێکی ئەنجام داوەو سەری بۆ کافربوونی کێشاوە، کەواتە پێویستە تۆبـەی لەسـەر بکـاتو بـۆ لای خودا بگەڕێتەوە، ئیتر جیابوونەوەو لە دژی دەرچوونو بە (خەواریج) ناویان دەرکرد. (عەلی) (عبدالله ی کوڕی عەباس)ی بۆ لا ناردن، ئەویش گفتوگـۆو مـشتومڕێکی زۆری لەگـەڵ کـردن، پاشان عەلی (خودا لێی ڕازی بێت) بە خودی خۆی وتووێـژی لەگـەڵ ئـەنجام دان، بەشـێکیان پەشیمان بوونەوەو گەڕانەوە، بەشەکەی تریشیان وەکـو خۆیـان مانـەوە، چـەند جـەنگێکی دوورو درێژ لە نێـوان عـەلیو ئەوانـدا ڕوویـدا، بەمـە سـوپاکەی عـەلی مانـدووو شـەکەت بـوو، زۆریـشی لێ کـەم بـۆوە، ئیـدی هـەر بەوانـەوە خـەریك بـوو و ئـەوانیش وازیـان لێ نـەهێنا تـا دەرەنجام غافڵگیریان کردو کوشتیان.

سامناکترین بابـەت لـە مێـژووی خیلافـەتی ڕاشـیدەدا مەسـەلەی (تـەحکیم)ە، زۆرێـك لـە نووسەران لە بەرانبەریدا سەریان لێ شێواوە، هەندێکی تر هاتوون سـەرکوێرانە دەسـتیان بـە نوسینەوەی کردووەو پشتیان بەو ڕیوایەتە لاوازو هەڵبەستراوانە بەستووە کە وێنەی هاوەڵـە بـەڕێزەکانی وەکـو (ئـەبو موسـای ئەشـعەری) تێـك دەدەنو دەڵـێن کـەودەنو ڕالاوازو خۆشباوەڕو تەفرەخواردوو بووەو هەتاکو بڵێی بێ ئاگا بووە، گوایە (عەمرووی کـوڕی عـاص) لە کاتی کۆبوونەوەکەدا فێڵی لێ کردووە، دەشڵێن گوایـە (عـەمرووی کـوڕی عـاص) فێڵبـازو تەفرەدەر بووە، ئەمەو داخ لە دڵانو دوژمنانی ئیسلام ویستوویانە ئـەم سیفەتە قێزەونانـە بەم دوو پیاوە گەورەوە بلکێنن، کە موسڵمانان بە ئامانجی کۆتایی پێهێنـانی ئـەو نـاکۆکیو ناتەباییە گەورەی سەری بۆ کوشتنی زۆرێك لە موسڵمانان کێشا هەڵیانبـژاردنو کردیـانن بـە وەکیلی خۆیان.

زۆربەی مێژوونووسانو ئەدیبانو لێکۆڵەران وەکو چەند شتێکی ڕاستو حاشـا هەڵنـەگری مێـژوویی هەڵسوکەوتیان لەگـەڵ ئـەم ڕیوایەتانـە کـردووە کـە لـە لایـەن دوژمنـانی هاوەڵـە ڕێزدارەکانەوە هەڵبەستراون، خەڵکیش بـەبێ پـالاوتنو لـە بێژنگـدان وەکـو شـتێکی ڕاسـتو دروسـتو بـێ گومـان لێیـان وەرگرتـوون، بێگومـان دەربڕینـی ئـەم بوختانانـە لـە شـێوەی چیرۆکداو هێنانی باسو خواستێك کە بە بابەتی فێڵو تەڵەکە لە لایـەن ئەوانـەوە داڕێـژرابێت، خـۆی لـە خۆیـدا کاریگـەری لەسـەر خـەڵك دروسـت دەکـاتو وادەکـات گرنگـی پـێ بـدەنو مێژوونووسە ئەدیبەکانیش لە نووسینەوەی کتێبەکانی خۆیاندا بایەخی پـێ بـدەن، بـا ئـەوە

بزانرێت کە تا ئێستاباسەکەمان لەسەر ئەو باس‌و خواسە دوورو درێژانەیە کە لەسەر (تەحکیم) کراون نەوەك خودی (تەحکیم)، چونکە (تەحکیم) لە بنەڕەتدا هەقێکی بێگومانی حاشا هەڵنەگرە.[1]

## پێنجەم: دەقی ڕێکەوتنامەکەی (تەحکیم):

بسم الله الرحمن الرحيم:

١ـ ئەمە ئەو بڕیارەیە کە (عەلی کوڕی ئەبو تالیب)و (معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان)و تاقمەی هەردووکیان بەپێی حوکمی کتێبی خوداو سونەتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) پێی گەیشتن‌و بە ڕەزامەندی هەردووکیان لەسەری ڕێککەوتن.

٢ـ بڕیاردانی (عەلی) بەسەر خەڵکی عێراقدا (ئامادەو نائامادەیان)دا دەچەسپێت، بڕیاردانی (معاویە) بەسەر خەڵکی شام (ئامادەو نائامادەیان)دا دەچەسپێت.

٣ـ هەردوو لامان ڕازی بووین لە بەرانبەر حوکمی قورئان (لە فاتیحەوە تا کۆتاییەکەی) بە گەردنکەچی ڕاوەستین، حوکمی ژیان بۆ کێ دەربکات دەیبەخشین، حوکمی مەرگ بەسەر کێدا بدا دەیکوژین، لەسەر ئەمە ڕازی بووین‌و پێکهاتین.

٤ـ (عەلی)و تاقمەکەی ڕازی بوون بە (عبدالله ی کوڕی قەیس) وەکو چاودێرو بڕیاردەر، (معاویە)و تاقمەکەی ڕازی بوون بە (عەمروی کوڕی عاص) وەکو چاودێرو بڕیاردەر.

٥ـ بە جۆرێك (عەلی)و (معاویە) لەسەر بەڵێن‌و ئۆباڵداری خوداو پێغەمبەرەکەی (عبدالله ی کوڕی قەیس)و (عەمروی کوڕی عاص) ڕادەسپێرن کە: دەبێت قورئان بکەن بە ئیمامی خۆیان‌و لابەلای هیچ شتێکی تردا نەکەنەوە، حوکم بە پێی دێڕە نووسراوەکانی بدەن، ئەگەر حوکمەکەیان لە کتێبی خودادا نەدۆزیەوە، دەبێ بیگێڕنەوە بۆ سوننەتە هەمەلایەنەکەی پێغەمبەری خودا (ﷺ)، بە جۆرێك نابێ بە پێچەوانەی ئەو ڕەفتار بکەن‌و هیچ شك‌و گومانێکیشی تێدا بێڵنەوە.

٦ـ (عبدالله ی کوڕی قەیس)و (عەمروی کوڕی عاص) لەسەر دەستی خودا بەڵێن لە (عەلی)و (معاویە) دەسێنن، هەرکات بە پێی کتێبی خوداو سوننەتی پێغەمبەرەکەی حوکمیان دەرکرد، ئەوا دەبێ ڕازی ببن‌و هیچ کامێکیان بۆی نیە لێی کەم بکاتەوەو پێچەوانەی بجوڵێتەوە.

---

١ مرويات (أبي مخنف) في تاريخ الطبري (ص: ٣٧٨)، تنزيه خال المؤمنين (معاوية) (ص: ٣٨).

٧ـ هەردووکیان (مادام لە هەق تێی ناپەڕێنن) لەنێو حوکومەتەکانیاندا، خۆیانو خوێنیانو ماڵیانو مویانو پێستیانو کەسو کاریانو منداڵیان چەپاڵە دراون، ئیدی کێ ڕازیە با ڕازی بێت کێش پێی ناخۆشە با پێی ناخۆش بێت، ئۆممەت لە بەرانبەر ئەو بڕیارو حوکمەی بە گوێرەی کتێبی خودا دەری دەکەن پشتگیریانە.

٨ـ ئەگەر هاتوو یەکێك لە دوو حەکەمەکان پێش دەرکردنی دوابڕیارو حوکمدان وەفاتی کرد، ئەوا کۆمەڵو پشتیوانانی ئەو دەتوانن کەسێکی دادپەروەرو چاکەکاری لە جێ دانێنو هەمان پەیمانو ئۆباڵداری کۆچکردووی لێ بسێنن.

٩ـ ئەگەر هاتوو پێش کۆتایی هاتنی ماوەی دیاریکراو بۆ مەسەلەکە، یەکێك لە دوو (ئەمیر)ەکان وەفاتی کرد، ئەوا کۆمەڵەکەی خۆی بۆیان هەیە کسێکی وای لە جێ دانێن کە لە دادپەروەریەکەی ڕازین.

١٠ـ (تەحکیم) لە نێوان هەردوولادا بڕیاری لەسەر دراو بە مەش قۆناغی جەنگ تێپەڕی وگەیشتن بە قۆناغی گفتوگۆکردن.

١١ـ هەر بڕیارو حوکمێك کە لە نێو ئەو پەیماننامەیەدا ناومان بردووەو پەیوەستە بەو مەرجانەی لەسەر هەردوو (ئەمیر)و هەردوو (حەکەم)و هەردوو (لایەن) دانراوە دەچێتە بازنەی (واجب)ەوە، خودا نزیکترین ئاگادارو شایەدەو خودا بەسە کە شایەد بێت. ئەگەر (عەلی)و (معاویە) سەرپێچی پەیماننامەکەیان کردو دەستدرێژیان کرد، ئەوا ئۆممەت لە حوکمو بڕیاری ئەوان بەریەو لە چوارچێوەی پەیمانو ئۆباڵداری دەردەچن.

١٢ـ خەڵك تا کۆتایی هاتنی ماوەی دیاریکراو لە خۆیانو کەسو کاریانو ماڵو منداڵیانو ئەمین دەبن، چەك دادەنرێت، ڕێگاوبان ئەمین دەبێ، ئەم بڕیارو حوکمە ئامادەو نائامادەی هەردوولا دەگرێتەوە.

١٣ـ دەبێت هەردوو (حەکەم) لە شوێنێکی هەڵکەوتووی نێوان شامو عێراق کۆببنەوەو گفتوگۆ بکەن.

١٤ـ جگە لەو کەسانەی بۆ خۆیان پێیان خۆشەو ڕەزامەندی هەردوو حەکەمی لەسەرە، کەسی تر بۆی نیە ئامادەی کۆبوونەوەکانیان بێت.

١٥ـماوەی (کۆبوونەوەو گفتوگۆکانیان) تا کۆتایی مانگی ڕەمەزانە، ئەگەر حەکەمەکان بڕیاریان لەسەر پێشخستنی حوکمدانەکە دا دەتوانن پێشی بخەن، ئەگەر بڕیاریان لەسەر دواخستنی دا دەتوانن دوای بخەن.

١٦ـ ئەگەر حەکەمەکان نەيانتوانی بە گوێرەی کتێبی خوداو سوننەتی پێغەمبەرەکەی لە دوا مۆڵەتی ماوەی دياريکراودا هيچ حوکمێك لەسەر مەسەلەکە دەربکەن، ئەوا هەردوو لايەن دەگەڕێنەوە نێو بارودۆخی پێشوو (کە شەڕە).

١٧ـ ئۆممەت لە بەرانبەر ئەم مەسەلەيەدا پەيمان بە خودا دەداتو هەر هەموويان لە بەرانبەر هەر کەسێکدا دەرهەق بەم مەسەلەيە کوفرو ستەم ڕەچاو بکاتو پێچەوانە ڕەفتار بکات دەبنە يەکدەست.

هەريەك لەم ناوانەی شايەدی نووسينەوەی ئەم پەيماننامەيە بوون.

لە بەرەی (عەلی): {(حەسەنو حوسێن)ی کوڕانی (عەلی)، عبدالله ی کوڕی عەباس، عبدالله ی کوڕی جەعفەری کوڕی ئەبو تاليب، ئەشعەثی کوڕی قەيسی کندی، ئەشتەری کوڕی حارث، سەعيدی کوڕی قەيسی هەمەدانی، (حصين)و (طفيل)ی کوڕانی حارثی کوڕی عبدالمطلب)، ئەبو سەعيدی کوڕی ڕەبيعەی ئەنصاری، عبدالله ی کوڕی خەبابی کوڕی ئەرەت، سەهلی کوڕی حونەيف، ئەبو بيشری کوڕی عومەری ئەنصاری، عەوفی کوڕی حارثی کوڕی عبدالمطلب، يەزيدی کوڕی عبدالله ی کوڕی ئەسلەمی، عوقبەی کوڕی عامری جوهەنی، ڕافيعی کوڕی حەريجی ئەنصاری، عومەری کوڕی حومقی خوزاعی، نوعمانی کوڕی عجلانی ئەنصاری، حجری کوڕی عەدی کيندی، يەزيدی کوڕی حەبيبەی نکری، مالکی کوڕی کەعبی هەمەدانی، ڕەبيعەی کوڕی شورحەبيل، حارثی کوڕی ماليك، حجری کوڕی يەزيد، عەلبەی کوڕی حەجيە}.

لە خەڵکی شام ئەم کەسانە ئامادەبوون:

{حەبيبی کوڕی موسليمەی فەهری، ئەبو ئەعوەری سەلەمی، بيشری کوڕی ئەرتەئەی قورەيشی، معاويەی کوڕی خەديجی کندی، مەخارقی کوڕی حارثی زوبێدی، موسليمی کوڕی عەمروی سەکسی، عبدالله ی کوڕی خالدی کوڕی وەليد، حەمزەی کوڕی ماليك، سوبەيعی کوڕی يەزيدی حەزرەمی، عبدالله ی کوڕی عەمروی کوڕی عاص، عەلقەمەی کوڕی يەزيدی حەزرەمی، يەزيدی کوڕی ئەبجەری عەبەسی، مەسروقی کوڕی حەبەلەی عەکی، بوسری کوڕی يەزيدی حومەيری، عبدالله ی کوڕی عامری قورەيشی، عوتبەی کوڕی ئەبی سوفيان، محمدی کوڕی ئەبی سوفيان، محمدی کوڕی عەمروی کوڕی عاص، عەمماری کوڕی ئەحوەصی کەلەبی، مەسعەدەی کوڕی عەمروی عەتبی، صەباحی کوڕی جلهەمەی حومەيری، عبدالرحمن کوڕی ذی کولاع، تەمامەی کوڕی حەوشەب، عەلقەمەی کوڕی حەکەم}.

ئەم پەیماننامە (ی تەحکیم)ە لە ڕۆژی (چوارشەممە)دا کە (١٣) شەوی ماون لە مانگی صەفرداو لە ساڵی سیو حەوت (٣٧)دا نووسرایەوە.[١]

## شەشەم: چیرۆکە مەشهورەکەی (تەحکیم)و پوچەڵکردنەوەی لە چەند ڕووەوە:

قسەی زۆر لەسەر چیرۆکەکەی (تەحکیم) کراون، مێژوونووسو ئەدیبان وەکو ڕاستیەکی حاشاهەڵنەگری مێژوویی دەستاودەستیان پێکردووە، هەیانە بە دوورو درێژیو هەیانە بە کورتیو هەیانە بە شەرحکردنو لێهەڵبژاردن بە مەبەستی وانە وتنەوە هێناویەتی، ئەوەی مابێتەوە حوکمدان لەسەر ناوەڕۆکەکەیەتی، زۆر بە کەمی کەسێکت دەست دەکەوێت وەکو توێژەرو ساغکەرەوەو پشکنەرێك هەڵوێستەی لە بەرامبەردا کردبێت، (إبن العربي) کارێکی ڕێکوپێكو ناوازەی کردوە، کە بە کورتی بەرپەرچی داوەتەوە، هەرچەندە بەرپەرچەکەی دوورو درێژ نیە، بەڵام ئەم کارەی دەبێتە بەڵگە لەسەر بەهێزی هەستی ڕەخنەگرانەی لە بەرانبەر دەقەکاندا، بێگومان چیرۆکی (تەحکیم) هەر لە بڕگەیەکیڕا تا بە هەمووی ڕادەگات ناتوانێت خۆ لە بەرانبەر توێژینەوەو ڕەخنەی زانستی ڕابگرێت، بەڵکو لە چەند ڕووەوە پووچەڵە:

١ـ هەموو ڕێبازەکانی (گێڕانەوەی) کزو لاوازن: بەهێزترین ڕێبازێك کە لێیەوە گێڕدرابێتەوە ئەمەیە: کە (عبدالرزاق)و (طبري) بە سەنەدێك (کە پیاوەکانی جێی متمانەن) لە (زوهەری)یەوە بە (مورسەلی) گێڕاویانەتەوە، کە دەڵێت: (زوهەری) وتی: خەڵکی (شام) بەیانییان بە بەرزکردنەوەی موصحەفەکان کردەوە، بانگیان ڕاهێشت حوکم بەنێوەڕۆکی (موصحەف) بکرێت، خەڵکی عێراق لە بەرانبەر (موصحەف)دا سامو هەیبەت گرتنی، لەو دەمەدا دوو حەکەمیان دانان، خەڵکی (عێراق) (ئەبو موسای ئەشعەری)یان هەڵبژارد، خەڵکی (شام) (عەمروی کوڕی عاص)یان هەڵبژارد، کاتێك دوو حەکەمەکە کاری نێوبژیوانیان کرد خەڵکی (صەفین) دەماریان گرژ بوو، دوو حەکەمەکە مەرجیان دانا: کێ قورئان بەرز بکاتەوەو بە حوکمی ئەو ڕازی بێت ئەوان بەرزی دەکەنەوە، کێ قورئان نزم بکاتەوەو بە حوکمی قایل نەبێت ئەوانیش دایدەبەزێننو کەسێکی تر بۆ سەرکردایەتی ئۆممەتی (محمد) (ﷺ) دادەنێنو ئەوان بۆ ئەمە لە (دومة الجندل) کۆبوونەوە دەکەن، ئەگەر لەوێ بۆیان ڕێك

---

١ الوثائق السياسية (ص: ٥٣٧، ٥٣٨)، الاخبار الطوال للدينوري (ص: ١٩٦، ١٩٩)، أنساب الأشراف (١/٣٨٢)، تاريخ الطبري (٥/٦٦٥، ٦٦٦)، البداية والنهاية (٧/٢٧٦، ٢٧٧).

نەکەوت، ساڵی داهاتوو لە (ئەذرەح) کۆ دەبنەوە، کاتێك (عەلی) بەرەو (کوفە) گەڕایەوە، (حەڕوڕییە) -کە تۆبەرەی گروهی (خەواریج)بوون- لێی جیابوونەوەو لە دژی دەرچوون، ئەمە یەکەم شت بوو دەرکەوت، ئامادەیی خۆیان بۆ شەڕلەگەڵکردنی ڕاگەیاندو ئاوا وەڵامیان دایەوە: کە ئەو لە حوکمی خودای (عز وجل)دا مرۆڤی کردووە بە (حەکەم) و وتیان: (لا حکم إلا لله سبحانه)، واتە حوکم تەنها هەقی خودایەو ئیتر دەستیان بە جەنگو هەرا کرد.

کاتێك هەردوو (حەکەم) لە (ئەذرەح) بە یەکتر گەیشتن‌و کۆبوونەوە، (موغیرەی کوڕی شوعبە) بە خۆی‌و کۆمەڵێك خەڵك(ی بێلایەن)ەوە هاتە ئەوێ، حەکەمەکان بە دوای (عبداللەی کوڕی عومەری کوڕی خەتاب)و (عبدالله ی کوڕی زوبێر)یاندا ناردو خەڵکێکی زۆریان بە پیرەوە ناردن، معاویەو خەڵکی شام لە کاتی دیاریکراودا هاتن، عەلی‌و خەڵکی عێراق نەهاتن، (موغیرەی کوڕی شوعبە) ڕووی کردە خەڵکانێکی خاوەنڕاو بە ئەزموونی (قورەیش)و وتی: ئایا کەستان نایە لەنێو ئەم خەڵکەدا بتوانێت پێشبینی ڕێکەوتن یان ڕێنەکەوتنی دوو حەکەمەکە بکات؟ وتیان: پێمان وا نیە کەس ئەمە بزانێت، وتی: سوێند بە خوا من گومان نابەم، با بچم ڕووبەڕووی هەردووکیان ببمەوە پرسیاریان لێ بکەم، ئەمجا بە تەواوەتی تێیان دەگەم. (عەمروی کوڕی عاص) هاتە ژوورەوەو (موغیرە) پێی وت: ئەی ئەبا عبدالله: وەڵامی پرسیارەکەم بدەوە، ئێمەی کۆمەڵی (بێ لایەن) چۆن دەبینن؟ ئێمە سەبارەت بەو شتەی سەبارەت بەم جەنگو کوشتارە بۆ ئێوە ڕوون بووەتەوە کەوتووینەتە شکوگومانەوە، پێمان وابوو ئارام بگرین‌و چاوەڕێ بکەین تا ئوممەت یەك دەگرێتەوە. عەمرو وتی: ئێوەی بێلایەن لە پشت چاکەکاران‌و لەبەردەم تاوانباراندا دەبینم.

(موغیرە) ڕووی وەرگێڕاو هیچ پرسیاری تری لێ نەکردو چوو بۆ لای (ئەبو موسا)و ئەو پرسیارەی لە (عەمرو)ی کرد لە ئەویشی کرد.

(ئەبو موسا) وتی: دەتانبینم چەسپاوترین ڕاوبۆچوونتان هەیە ، ئەو موسڵمانانەی توشی جەنگ نەبوون لەگەڵ ئێوەدان، ئیدی (موغیرە) ڕووی وەرگێڕاو هیچ پرسیاری تری نەکردو ڕۆیشت تا خۆی گەیاندەوە ئەو قورەیشیانەی پرسیاری پێشبینیەکەی لێکردبوون‌و، وتی: ئەم دوو حەکەمە لەسەر هیچ شتێك ناگەنە یەك‌و ڕێك ناکەون.

هەردوو حەکەم کۆبوونەوەو دەستیان بە وتووێژ کرد، (عەمروی کوڕی عاص) وتی: پێشنیار دەکەم، یەکەم حوکمی هەق دەربارەی خەڵکانی خاوەن بەڵێن‌و خەڵکانی بەڵێنشکێن‌و بێ وادە دەربکەی. (ئەبو موسا) وتی: ئەوە کامەیە؟ (عەمرو) وتی: ئایا ئەوە

نازانی کە معاویەو خەڵکی شام بەڵێنی خۆیان بردۆتە سەرو لەو کاتو شوێنەی بۆمان دیاری کردبوون ئامادە بوون. ئەبو موسا وتی: با، (عەمرو) وتی: بینووسە، (ئەبو موسا) ئەمەی نووسی. (عەمرو) وتی: ئایا تۆ لەسەر ئەو رایەی کە پیاوێك بۆ سەرپەرشتی کاروباری ئوممەت دیاری بکەین؟ بۆم دیاری بکە، ئەگەر توانای ئەوەی هەبوو ئەوا پێویستە بە دوات بکەوم، ئەگەر نا من دیاری دەکەمو ئەگەر توانای ئەوەی هەبوو ئەوا پێویستە لەسەرت بە دوام بکەوی، ئەبو موسا وتی: من (عبدالله ی کوڕی عومەر) دیاری دەکەم، عەمرو وتی: من (معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان) دیاری دەکەم، ئیدی دانیشتنو مشتومڕ درێژەی کێشا تا کار بەوە گەیشت دەستیان بە شەڕە قسە کرد، ئەمجا هاتنە دەرەوەو لە بەرانبەر خەڵکدا قسەیان دەکرد:

(ئەبو موسا) وتی: ئەی خەڵکینە من (عەمرو)م وەك ئەو کەسە هاتە بەر چاو کە خوای گەورە لە قورئاندا دەربارەی دەفەرموێت: ﴿وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱلَّذِيٓ ءَاتَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنۡهَا﴾[1] واتە: هەواڵی ئەو کەسەیان بەسەردا بخوێنەوە کە لە زانستی خۆمان پێمان بەخشیبوو، ئیدی چۆن مار لە کاژ دەردەچێت، ئەویش خۆی لەو بەرگو پۆشاکی زانستە داماڵی. کە (ئەبو موسا) بێدەنگ بوو، (عەمرو) دەستی بە قسە کردو وتی: ئەی خەڵکینە، من (ئەبو موسا)م وەك ئەو جۆرە کەسە هاتە بەرچاو کە خودای گەورە لە قورئاندا دەربارەی دەفەرموێت: ﴿مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ ثُمَّ لَمۡ يَحۡمِلُوهَا كَمَثَلِ ٱلۡحِمَارِ يَحۡمِلُ أَسۡفَارَۢا﴾[2] واتە: وێنەی ئەو کەسانەی تەوڕاتیان پێدراو پاشان بە ئەستۆی خۆیان نەگرتو کاریان بە نێوەڕۆکەکەی نەکرد، وێنەی ئەو گوێدرێژە وان کە کتێبەکانی زانستی لێ بارکراون، ئیدی هەریەکەیان ئەنجامی کۆبوونەوەکەو ئەو وێنەیەی لەسەر بەرانبەرەکەی هێنابۆوە نوسیەوەو بەسەر شارو وڵاتانیدا دابەش کرد.[3]

بێگومان (زوهەری)ی ڕاوی چیرۆکەکە، ڕووداوەکەی بە چاوی خۆی نەدیوەو لەو سەردەمەدا نەژیاوە، کەواتە ڕیوایەتەکە (موڕسەلە)، ڕیوایەتی (موڕسەل)یش بە گوێرەی بڕیاری زانایان وەکو نوسینی سەر ئاو یان نێو هەوایەو بە هیچ شێوەیەك ناکرێتە بەڵگە.[4]

---

١ الاعراف (١٧٥).

٢ الجمعة (٥).

٣ المصنف (٥/٤٦٣)، مرويات تاريخ الطبري (ص: ٤٠٦).

٤ المراسيل لإبن حاتم (ص: ٣)، الجرح والتعديل (١/٢٤٦).

لێرەدا ڕێبازێکی تر بۆ هێنانی چیرۆکی ناوبراو هەیەو (إبن عساکر) بە سەنەدی خۆی لە (الزهري)یەوە ڕیوایەتی کردووەو وەکو ئەوەی زانیمان (مورسەل)ەو کەسێکی وەکو (أبوبکری کوڕی أبی سبرە) لەنێو زنجیرەی سەنەدەکەیدایەو (ئیمام ئەحمەد) دەربارەی دەڵێت: فەرموودەی بە دەم پێغەمبەرەوە هەڵدەبەستن،[1] هەروەها (واقدي)یش لەنێو سەنەدەکەیدایە کە (مەتروك)ە.[2]

دەقی ڕیوایەتەکە: ..... خەڵکی شام (موصحەف)ەکانیان بەرز کردنەوەو وتیان: بانگتان دەکەین بۆ لای کتێبی خوداو حوکم کردن (و چارەسەرکردنی کێشەکانی نێوانمان) بە پێی نێوەڕۆکەکەی، ئەمە فێڵێك بوو لە لایەن (عەمروی کوڕی عاص)ەوە ئەنجام درا، ئیتر صوڵحیان کردو نوسراوێکیان لە نێوان خۆیان ئیمزا کردو بڕیاریان دا سەری ساڵی تازە لە (ئەذرەح) دەست بە (گفتوگۆ) بکەن، ئەمەو دوو (حەکەم)یان دانانو، دەبێت سەرنجی کاروباری خەڵك بدەنو بەرژەوەندیان ڕەچاو بکەن، دەبێ هەردوو (ئەمیر)یش بە ئەنجامی حوکمەکەیان ڕازی بن، (عەلی) (ئەبو موسای ئەشعەری) کردە (حەکەم)ی خۆی، (معاویە)ش (عەمروی کوڕی عاص)ی کردە (حەکەم)ی خۆی، خەڵك بڵاوەکێنەیان کرد، (عەلی) بە دوودڵیو سەرقاڵبوون بە گەندەڵیو ناکۆکی هاوەڵانیەوە بەرەو (کوفە) گەڕایەوە، هاوەڵانی لەگەڵی کەوتنە ناکۆکی، تاقمەیەك لە هاوەڵانی کە پێیان دەوترا (خەواریج) لە دژی هەڵگەڕانەوە، ڕەخنەیان لە (تەحکیم)ەکەی گرتو وتیان: حوکم تەنها مافی خودایە. (معاویە)ش بە یەکدڵیو بە یەکبڕیاریو کۆکی هاوەڵانیەوە، بەرەو شام گەڕایەوە، دوابەدوای نوێبوونەوەی ساڵ، لە شەعبانی سیو هەشت (٣٨)دا هەردوو (حەکەم) لە شوێنی دیاریکراوی خۆیان لە (ئەذرەح) ئامادە بوون، دەورەیان بە ئاپۆڕای خەڵك گیرابوو، وتووێژێك لە نێوانیاندا ئەنجامدرا، بە نهێنی لەسەر بڕیارێك ڕێکەوتبوون، بەڵام لە بەرانبەر خەڵکدا لە کاتی ئاشکراکردنیدا (عەمروی کوڕی عاص) پێچەوانە جوڵایەوە، (ئەبو موسا) لە پێشدا دەستی بە قسەکردو (عەلی)و (معاویە)ی لێخستن، ئەمجا (عەمروی کوڕی عاص) دەستی بە قسەکردو (عەلی) لێخستو (معاویە)ی لەجێی خۆی هێشتەوە. ئیتر هەردوو (حەکەم) لێکترازانو خەڵکی دەوروبەریشیان پەرتەوازە بوون، لە مانگی نێوجەژنان (ذي القعدة)ی ساڵی (٣٨)دا خەڵکی شام بەیعەتیان بە (معاویە)دا.[3]

---

١ تهذیب التهذیب (١٢/٢٧)، مرویات تاریخ الطبري (ص: ٤٠٦).

٢ مرویات تاریخ الطبري (ص: ٤٠٦).

٣ تاریخ دمشق (١٦/٥٣).

ـێ چتان کردووە؟ ئەویش دەچێتو ئەم پرسیارەیان لێ دەکات، عەمرو وتی: خەڵك لە خۆڕا یتیانو دەڵێن، بە خوا ئەوەی وتویانەو دەیڵێن ڕاست نیە، بەڵام کاتێك منو (أبو موسی) کۆبووینەوە، پێم وت: دەربارەی ئەم کاروبارە (خیلافەت) ڕات چۆنە؟ وتی: بە ڕای من ـەبێت بۆ یەکێك لە ئەو کەسانە بێت کە کاتێك پێغەمبەری خودا (ﷺ) وەفاتی کرد لێیان ڕازی بوو، وتی: وتم: (منو معاویە) لە کوێی ئەم کاروبارە دادەنێی؟ وتی: ئەگەر (عەلی) پشتی خۆی بە ئێوە ببەستێت، ئەوا چاوەڕوان دەکرێت پشتوپەنای بە هۆی ئێوە قایمتر بێ، ئەگەر خۆی لە ئێوە بێ نیاز بکاتو کاری پێ نەبن، ئەوا کاروباری خودا بۆ هەمیشە لە ئێوە بێ نیاز بووە.[1]

لە لایەکی ترەوە (ئەبو موسا) سەبارەت بە خۆپاریزی (عەمرو) قسەی کردووەو وتوویەتی کە ئەو: لێپرسینەوەی لەگەڵ نەفسی خۆی دەکردو باسی ژیانو گوزەرانی (ئەبو بەکرو عومەر)ی دەکردو مەترسی خۆی لە بەرانبەر ڕوودانی فیتنەکانی دوای ئەوان ـەخستەڕوو، (ئەبو موسا) وتی: (عەمروی کوڕی عاص) پێی وتم: سوێند بە خودا ئەگەر ئەبو بەکر)و (عومەر) ئەو سامانەیان نەویستبێت کە بۆیان حەڵاڵ بووە، ئەوا ڕەنجەڕۆ بوونو هەڵەبوونو بیروبۆچوونیان کەچ بووە، بەڵام بە خودا ئەوان ڕەنجەڕۆو هەڵەو کەچفام نەبوون، سوێند بە خودا هەرچی ترسو تۆقانو لاوازییە تەنها لە ڕێی نەفسی (بەدی) خۆمانەوە توشمان بووە.[2]

٤ـ (معاویە) دانی بەوە دادەهێنا کە: (عەلی) لە ئەو پایەدارترەو بۆ خیلافەت شایانترەو بە هیچ شێوەیەك لەسەر ئەمە کێبەرکێی لەگەڵ نەکردووەو هەتا (عەلی) لە ژیاندا بووە داوای ئەم پۆستەی نەکردووە. (یەحیای کوڕی سلێمانی جەعفی) بە سەنەدێکی (جەیید)ەوە،[3] لە (ئەبی موسلیمی خەولانی)یەوە گێڕاویەتیەوە کە: (ئەبو موسلیم) بە (معاویە)ی وت: تۆ لەسەر خیلافەت کێشمەکێش دەکەیو پێت وایە وەکو ئەوی؟ وتی: نەخێر، من چاك دەزانم کە ئەو لە من گەورەترەو بۆ ئەم پۆستەش شیاوترە، بەڵام نەتانزانیوە کە عوسمان بە مەزڵومی کوژراوەو منیش ئامۆزاو خوێنگرو خوێنئەستێنی ئەوم؟ بۆ لای (عەلی) بچنو پێی

---

١ التاريخ الكبير (٥/٣٩٨).
٢ العواصم من القواصم (ص: ١٧٨ـ١٨٠).
٣ فتح الباري (١٣/٨٦).

بەڵام سەبارەت بە ئەو ڕیوایەتانەی لە ڕێگای (أبي مخنف)و (أبي جناب الكلبي)یەوە هاتوون، ئەوا بە خاتری خودی ڕاویەكان خۆیانەوە لاوازو نەخۆش (ضعیف ومعلول)ن، هەرچی (أبي مخنف لوطی كوڕی یەحیا)یە زەعیفەو جێی بڕوا پێكردن نیە،[1] ڕافیزەیەكی توندڕەوەو مەتركو تالیفە، هەرچی دووەمیشیانە (إبن سعد) دەربارەی دەڵێت: زەعیفە.[2] (بوخاری)و (أبو حاتم) دەڵێن: (یحیی القطان) بە لاوازی داناوە،[3] (عثمان الدارمي) دەڵێت: لاوازە،[4] (النسائي) دەڵێت: لاوازە،[5] ئەمە هەموو ئەو ڕێبازانەن كە چیرۆكە مەشهورەكەی (تەحكیم)و گتوگۆو ڕووبەڕووبوونەوە ڕێكخراوەكەی نێوان (ئەبو موسا)و (عەمروی كوڕی عاص)ی لێوە هاتووە، كە هەر هەموویان زەعیفو كزو لاوازن، ئایا بەم جۆرە ڕیوایەتانە بەڵگە دەهێنرێتەوە، یان مێژووی هاوەڵە بەڕێزەكانو سەردەمی خەلیفە ڕاشیدەكانو سەردەمی پێشەنگایەتی ئوممەت لەسەر بنەمای ئەم ڕیوایەتانە هەڵدەچنرێتو دەنوسرێتەوە؟!، خۆ ئەگەر ڕیوایەتەكان جگە لە هەبوونی هاودژیو تێكەڵوپێكەڵی دەقی بڕگەكانیان هیچ بەڵایەكی تریان لێ نەبووایە، ئەوا ئەوەندە بەس بوو كە بە (زەعیف) دابنرێن، جا چ جای ئەوە كە خودی سەنەدەكانیشیان كزو زەردەڵە و لاواز بن.[6]

٢ـ گرنگی ئەم مەسەلە لە بواری عەقیدەو تەشریعدا: لەگەڵ ئەمەشدا بە سەنەدێكی (صەحیح) پێمان نەگەیشتووە، خۆ مەحاڵە زانایان لەگەڵ ئەو هەموو گرنگییەیو پێویستبوونی زۆرمان پێی هەر لە خۆڕا ئیهمالی بكەنو باسی لێوە نەكەن.[7]

٣ـ ڕیوایەتێكی تر هەیە بە تەواوەتی پێچەوانەی ئەو ڕیوایەتانەیە كە ڕابوردن، ڕیوایەتەكە: (بوخاری) بە كورتی لە (تاریخ)ەكەیداو بە سەنەدێك كە هەموو ڕاویەكانی جێی باوەڕن، هێناویەتیو (إبن عساكر)یش بە درێژی هێناویەتی:

لە (حەصینی كوڕی مونزیر)ەوە، دەڵێت: كە (معاویە) بۆ لای (عەمروی كوڕی عاص)ی ناردووەو پێی وت: من هەواڵم سەبارەت بە (عەمرو)و (ئەبو موسا)وە پێ دەگەن، بچۆ پێیان

---

١ تحقيق مواقف الصحابة (٢/٢٢٣).

٢ مرويات أبي مخنف (ص: ٤٠٧).

٣ التاريخ الكبير (٤/٢٦٧)، الجرح والتعديل (٩/١٣٨).

٤ التاريخ للدارمي (ص: ٢٣٨)، تحقيق مواقف الصحابة (٢/٢٢٣).

٥ الضعفاء والمتركون (ص: ٢٥٣).

٦ مرويات أبي مخنف في تاريخ الطبري (ص: ٤٠٨).

٧ المصدر نفسه (ص: ٤٠٨).

بڵێن: باقاتیلەکانی عوسمان ڕادەست بکات، منیش بەیعەت و خیلافەتی بۆ دەسەلمێنم، ئەوانیش چوون بۆ لای (عەلی) و قسەیان لەگەڵ کرد، بەڵام ڕادەستی نەکردن.[١]

ئەسڵی کێشەی نێوان (عەلی و معاویە) (خودا لێیان ڕازی بێت) تا ئەمە بوو، (تەحکیم)یش بۆ چارەسەری ئەم کێشەیە دانرا نەك بۆ هەڵبژاردن یان لێخستنی خەلیفە،[٢] (إبن حزم) سەبارەت بە ئەمە دەڵێت: (عەلی) ئیمام بوو و واجب بوو فەرمانبەرداری بۆ بکرێت، (معاویە) ئامادە نەبوو لە تەواوی خاکی وڵاتی شامدا فەرمانەکانی ئەو جێبەجێ بکات، لەبەر ئەمە (عەلی) جەنگی لەگەڵ کرد، هەرچەندە (معاویە) قەت لاموجیمی لە ڕاست پایەداری مەزنایەتی (عەلی) و شایستەبوونی بۆ پۆستی (خیلافەت) نەکردووە، بەڵام ئیجتیهادەکەی گەیاندیە ئەو حاڵەو پێی وابوو دەبێت تۆڵە سەندنەوە لە قاتیلەکانی (عوسمان) پێش بەیعەتدان بخرێت، پێی وا بوو ئەو بە هۆی بە تەمەنیەکەی و هێزو دەسەلاتێك کە هەیەتی لە ڕۆڵەکانی (عوسمان) و ڕۆڵەکانی (حەکەمی کوڕی ئەبی عاص) لە پێشترە بۆ سەندنەوەی تۆڵەی خوێنی (عوسمان) و قسەکردن لەسەری، لە ئەم ئیجتیهادەیدا پێکای، بەڵام تەنها لە ئەوەدا کەوتە هەڵەوە و نەیپێکاوە کە ئەمەی خستە پێش بەیعەتدان.[٣] بێگومان ئەمە وێنەی ڕاستەقینەی ناکۆکیەکەیە، تێگەیشتن لە ناکۆکیەکەش بەم شێوەیە، ئاستی هەڵەی ڕیوایەتەکانی پێشتر دەربارەی (تەحکیم) و بڕیاری (حەکەم)ەکان دەردەخات، بێگومان حەکەمەکان سەبارەت بە دەرکردنی حوکمو بڕیارێك بۆ کۆتایی پێهێنانی کێشەی نێوان (عەلی) و (معاویە) کە خۆی لە وازۆکردنی حوکمی تۆڵە بەسەر قاتیلەکانی (عوسمان)دا دەخستە ڕوو ڕاسپێردرابوون، نەك سەبارەت بە (خیلافەت) یان داخوا کام لەم دووانە شایانترە بۆ خیلافەت، نەخێر وتووێژەکان نە کەم نە زۆر باسی مەسەلەی خیلافەتیان تێدا نەبوو، خۆ ئەگەر (حەکەم)ەکان ئەسڵی ئەو مەسەلەی بۆی ڕاسپێردراون فەرامۆش بکەن و بڕیارێك دەربارەی کاروباری خیلافەت دەربکەن (وەکو ڕیوایەتە مەشهورەکە ئەمە دەڵێت)، کەواتە ئەوان لە بابەتی کێشەکە تێنەگەیشتوون و باس و خواسەکانیان لەسەر بابەتی مەسەلەکە نەخولاونەوە، ئەمەش زۆر زۆر دوورە.[٤]

---

١ سير أعلام النبلاء (٣/١٤٠).

٢ مرويات أبي مخنف في تاريخ الطبري (ص: ٤٠٩).

٣ الفصل في الملل والنحل (٤/١٦٠).

٤ تحقيق مواقف الصحابة (٢/٢٢٥).

٥ـ ئەو مەرجانەی پێویستە لە (خەلیفە)دا هەبن بریتین لە دادپەروەری‌و زانستو ڕێوچوونێکی وا کاروباری ڕەعێتی پێ بەڕێوەبەرێت‌و بەرژەوەندیەکانی پێ دەستەبەر بکات‌و (قورەیش)یش بێت.[١] هەموو ئەم مەرجانە لە (عەلی)یدا هەبوون، جا ئایا ئەو بەیعەتەی پێی درابوو، بەسترابوو یان نا؟ ئەگەر بەسترابێت، ئەوە خۆ هیچ گومانی تێدا نیە کە ئەهلی (حەللو عەقد)و کۆچەران‌و پشتیوانان بەیعەتیان پێدابوو، نەیارەکانیشی دان بە ئەمەدا دێنن‌و قسەکانی پێشدای (معاویە)ش بەڵگەن لەسەر ئەمە، کەوا: (ئەگەر (ئیمام) لە سیفەتەکانی ئیمامانی کەم نەبوو، خودی ئەوانەی بەیعەتیان پێدابوو، خوازیاری لێسختنی بوون، ئەوا بە یەکدەنگی ئوممەت ڕێیان ناکەوێت ئەمە بکەن، چونکە گرێبەستی ئیمامەت لازم دەبێت‌و دەرفەتی هەڵوەشاندنەوەی تێدا نامێنێت مەگەر هۆکارێك (ی ڕەوا) ئەمە بخوازێت، پۆستی ئیمامەت بەبێ جێگیربوونی تەواوی‌و پابەندبوونی ئوممەت پێیەوە ڕێك ناکەوێت‌و ناتوانێت سوود بگەیەنێت‌و ئامانج‌و مەبەستەکانی خۆی بێنێتەدی، خۆ ئەگەر ڕەعێت ڕێی پێ بدرێت هەر کاتێك حەزی لێ بوو ئیمامی مەزن لێ بخات، ئەوا گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەرداری بۆ ئیمام دروست نابێت‌و، تواناو دەسەڵاتی درێژە ناکێشێت‌و هیچ واتایەکیش بۆ دانانی ئیمام بە ڕاست ناگەڕێت.[٢] کەواتە شتەکە بەو شێوەیە نییە کە ڕیوایەتەکان باسی لێوە دەکەن‌و هەر کەسێك بە ئیمامەکەی ڕازی نەبوو دەتوانێت لێی بخات، چونکە تەنها ئەهلی (حەللو عەقد) –ئەوانەی گرێبەستەکەیان بۆ ئەنجام داوە– دەتوانن گرێبەستەکە هەڵوەشێننەوە، ئەویش بەو مەرجەی ئیمام یەکی مەرجەکانی ئیمامەتی خستبێت‌و زیانی پێ گەیاندبن، جا ئایا (عەلی)ی خەلیفەی ڕاشید (خودا لێی ڕازی بێت) ئەمەی کردووەو؟ ئەهلی حەللوعەقد لەسەر لێخستنی ڕێککەوتوون؟! تا بە دوو حەکەمەکە بوترێت: لەسەر ئەمە پێك بێن؟، گومانی تێدا نیە (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) هەتا ڕۆژی وەفاتکردنی شتێکی وای لێ دەرنەکەوتووە ببێتە مایەی هەڵوەشاندنەوەی بەیعەتەکەی، جگە لە دادپەروەری‌و لێبڕاوی‌و چاکەکاری‌و خۆپاریزی‌و خێروبێر هیچ شتێکی تری لێ دەرنەکەوتووە.[٣]

---

١ الأحكام السلطانية للماوردي (ص: ٦)، الأحكام السلطانية لأبي يعلى (ص: ٢٠)، غياث الأمم (ص: ٧٩ ومابعدها).

٢ غياث الأمم (ص: ١٢٨)، مرويات أبي مخنف (ص: ٤١٠).

٣ الفصل في الملل والأهواء والنحل (٤/٢٣٨).

٦ـ (تەحکیم) لە سەرودەمی (ئاشوب)دا ئەنجام درا، بارودۆخی موسڵمانان لەگەڵ هەبوونی خەلیفەشدا ئاڵۆزابوو، باشە لەگەڵ لێخستنی (خەلیفە)دا کە بە بڕبڕەی پشتی جەستەی ئوممەت دادەنرێت، چۆن بارودۆخیان ئاسایی دەبێتەوەو ڕێك دەکەوێت؟!، بێگومان (ئەگەر شتێکی لەم شێوەیە ئەنجام بدرێت) ئەوا بارودۆخەکە زیاتر بەرەو تێکچوونو شێوان دەچێت، هاوەڵە بەڕێزەکانیش زۆر لەوە بیرتیژترو بە ئاوەزتر بوون هەنگاو بۆ کارێکی ئەوا هەڵێنن، بەم چەشنەو بە بەڵگەی عەقڵو نەقڵ پوچەڵی ئەم بۆچوونە ڕوون دەبێتەوە.

٧ـ (عومەری کوڕی خەتاب) (خودا لێی ڕازی بێت) پۆستی خیلافەتی لە (ئەهلی شورا)دا کورت هەڵێنا کە (٦) کەس بوونو کۆچەرانو پشتیوانانیش بەمە ڕازی بوون، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە تا یەك لەو شەش کەسانە لە ژیاندا بێت پۆستی خیلافەت سەرناکاتو کەسێکی تر بۆی نیە وەری بگرێت، لە سەردەمی (تەحکیم)یشدا تەنها (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص)و (عەلی) لە ژیاندا مابوون، هەرچی (سەعد)ە خۆی لە کاروبارەکان دوورەپەرێز کردو نە کەمو نە زۆر خۆی لە مەسەلەی ویلایەتو ئیمارەت نەگەیاند، ئیدی (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) ئەرکی ڕاپەڕاندنی کاروباری خیلافەتی پێ سپێردرا، باشە (عەلی)یەك کە دوای (عوسمان) پایەدارترین کەسی نێو ئەو شەش کەسە بووە چۆن ڕێی تێدەچێت ئەم پۆستە لە ئەو تێپەڕ بکاتو بە کەسێکی تر بسپێردرێت؟.[1]

٨ـ ڕیوایەتەکان وادەردەخەن کە (گوایە) خەڵکی (شام) دوابەدوای (تەحکیم) بەیعەتیان بە (معاویە) دابێت:

پرسیار دەکەین، چ شتێك وای لە خەڵکی شام کرد ڕێگە بە خۆیان بدەن بەیعەت بە (معاویە) بدەن؟، ئەگەر بە خاتری دەرەنجامەکانی (تەحکیم) بوبێت، ئەوە خۆ حەکەمەکان ڕێك نەکەوتنو هیچ بیانوو بەڵگەیەکی تریش لە ئارادا نەبووە تا ئەنجامدانی ئەم کارەیان پێ بدرێتە پاڵ، ئەمە لەگەڵ ئەوەدا کە (إبن عساکر) بە سەنەدێکی (جەیید) کە هەموو گێڕەرەوەکانی متمانەدارن لە (سەعیدی کوڕی عبدالعزیزی تنوخی)[2]ی زاناترین کەس بە کاروباری شام،[3] ڕیوایەت دەکاتو دەڵێت: (سەعید) وتی: (عەلی) لە عێراق ناوی بە (ئەمیری

١ مرويات تاريخ أبي مخنف (ص: ٤١١).

٢ سعيد بن عبدالعزيز التنوخي، ثقة إمام (التقريب).

٣ تهذيب التهذيب (٤/٦٠).

ئیمانداران) دەهێنرا، (معاویە) لە شام ناوی بە (ئەمیر) دەهێنرا، کاتێك (عەلی) كۆچی دوایی کرد، (معاویە) لە شام بە (ئەمیری ئیمانداران) ناوی دەبراو بانگی دەکرا.[١]

ئەم دەقە دەری دەخات کە: (معاویە) دوای وەفاتی (عەلی) بەیعەتی خیلافەتی پێدراوەو بەس، (طبري) لەسەر ئەم ڕایەیە، لە باسی دواڕووداوەکانی ساڵی چل (ی كۆچی)دا دەڵێت: لەم ساڵەداو لە (ئیلیا)دا بەیعەتی خیلافەت درا بە معاویە،[٢] (إبن کثیر) لە پەراوێزی ئەمەدا دەڵێت: واتە کاتێك (عەلی) كۆچی دوایی کرد، خەڵکی (شام) ڕێی بەردەمیان چۆڵ بووو بەیعەتی خیلافەتیان دا بە معاویە،[٣] خەڵکی شام چاکیان دەزانی کە (معاویە) هاوتاو هاوشانی (عەلی) نییەو هەتا ئەو (خودا لێی ڕازی بێت) هەبێتو بۆ کاری خیلافەت ڕاسپێردرێتو ئامادەیی تێدا هەبێت، ئەوا دروست نییە (خەلیفە)یەکی تر هەبێت، چونکە بە لای ئەوانەوە (عەلی)یش وەکو (ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان)ی دەستەبرای ناسراو بوو و، دەیانزانی کە لە هەموو بوارەکانی سابیقەو زانیاریو دینداریو ئازایەتیو جوامێریو تەواوی سیفەتە بەرزەکانی ترەوە پایەی بەرزە،[٤] وێڕای ئەمەش دەقەکان ڕێگرن لەبەردەم بەیعەتدانی خیلافەت بە کەسێکی تر لەگەڵ بوونی (خەلیفە)دا.

(موسلیم) لە صەحیحەکەیداو لە (ئەبو سەعیدی خودری)یەوە دەگێڕێتەوە: ئەبو سەعید وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: ((إذا بويع لخليفتين فاقتلوا الآخِرَ منهما))،[٥] واتە: کە بەیعەت بە دوو خەلیفە درا، دووەمینەکەیان بکوژن، ئەو دەقانەی ئەم واتایە دەدەن بە دەستەوە زۆرن.[٦] شتێکی مەحاڵو چاوەڕوان نەکراوە هاوەڵان بە پێچەوانەی دەقەکان ڕەفتار بکەن.[٧]

٩ــ (بوخاری) لە صەحیحەکەیدا لە (عبدالله ی کوڕی عومەر)ەوە دەگێڕێتەوەکە وتوویەتی: چوومە لای (حەفصە) (ئاو لە کەزیەی دەتکا) وتم: خۆ کاروباری خەڵك دەبینی، منیش (کاتی خۆی لە لایەن عومەرەوە) هیچ پۆستێکم بۆ دانەنراوە، وتی: خۆ بگەیەنە

---

١ تاريخ الطبري (٧٦/٧).
٢ المصدر نفسه (٧٦/٧).
٣ البداية والنهاية (١٦/٨).
٤ الفتاوى (٧٣/٣٥).
٥ صحيح مسلم (١٤٨٠/٣).
٦ سنن البيهقي (١٤٤/٨).
٧ مرويات أبي مخنف (ص: ٤١٢).

لایان، ئێستا ئەوان چاوەڕێت دەکەن، من دەترسم بە هۆی خۆبواردنی تۆوە پەرتەوازەییان لە نێواندا دروست ببێت، ئیتر وازی لێ نەدەهێنا تا بە ناچاری‌و لە ژێر گوشاری (حەفصە)دا ڕۆیشت، کاتێك کۆبوونەوەکە تەواو بووو خەڵك بڵاوەی کرد، (معاویە) وتاری داو وتی: کێ دەیەوێت دەربارەی ئەم پۆستە (ی خیلافەت) قسە بکات با سەر بەرز بکاتەوەو خۆی بەدەر بخات، خۆ ئێمە لە خۆی‌و لە باوکیشی بۆ ئەمە شایانترین!، (حەبیبی کوڕی موسلیمە) بە (عبداللە)ی وت: دەبوایە وەڵامت دابایەوە، (عبداللە) وتی: خەریك بوو پشتم هەڵێنم‌و سەرم بەرز بکەمەوەو پێی بڵێم: ئەو کەسەی لەسەر ئیسلام جەنگی لەگەڵ تۆو باوکت کردووە لە تۆ لە پێشترو شایانترە! بەڵام ترسام ئەگەر قسە بکەم پەرتەوازە دروست ببێت‌و خوێن بڕژێت‌و (قسەکەم) بە غەڵەت لێك بدرێتەوە، بۆیە زەینی خۆم بردە سەر ئەو هەموو نازونیعمەتانەی خوای گەورە لە بەهەشتدا ئامادەی کردوون، (حەبیب) وتی: دەك خوا لە ئاشوب‌و هەڵایساندنی بتپارێزێت‌و بتخاتە قەڵای خۆیەوە.[1]

لەم ڕیوایەتەدا بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ مەسەلەی بەیعەتدان بە (معاویە) دەفامرێتەوە، هەندێك زانا وتوویانە: ئەم قسانە لەو کۆڕەدا کراون، کە (حەسەنی کوڕی عەلی)و (معاویە) خوا لە هەموویان ڕازی بێت صوڵحەکەی نێوان خۆیان تێدا ئەنجامداوە.

(إبن الجوزي) دەڵێت: ئەم (وتارە) لەو دەمەدا بوو کە (معاویە) دەیەویست (یەزید)ی کوڕی بکاتە (وەلی عەهد)ی خۆی.

(ابن الحجر) پێی وایە لە کاتی (تەحکیم)دا بووە،[2] بەڵام بە گوێرەی خودی (دەقەکە) ڕای یەکەم‌و دووەم بەهێزترە، چونکە کاتێك (عبدالله ی کوڕی عومەر) دەڵێت: لە ترسی لێکترازانی جەماعەت‌و ڕژانی خوێن قسەم نەکرد، بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئەمە لە ڕۆژگارێکدا بووە هەموو لایەك لەسەر (معاویە) یەکدەنگ بوون، هەرچی ڕۆژگاری (تەحکیم)ە، ڕۆژگاری پەرتەوازەیی و ناتەبایی بوو نەك جەماعەت‌و پێکەوە جۆشدان.[3]

١٠ـ حەقیقەتی بڕیاردانەکەی (تەحکیم):

هیچ گومان لەوەدا نییە کە حەکەمەکان تەنها ئەو مەسەلەیان حەواڵەی ئۆممەت یان (ئەهلی شورا) کردووە کە (عەلی)و (معاویە) لەسەری ناکۆك بوون‌و ئەوانیش نەیانتوانی

---

١ البخاري (٥/٤٨).

٢ فتح الباري (٧/٤٦٦).

٣ مرويات أبي مخنف.

لەسەری پێك بێن کە تەنها خۆی لە مەسەلەی بکوژەکانی (عوسمان)دا بەرجەستە دەکرد، دەنا ئەو کاتە (معاویە) بانگەشەی پۆستی خیلافەتی بۆ خۆی نەکردووەو بە دانپێهێنانی خودی خۆی لاموجیمی لە شایستەبوونی (عەلی) نەکردووە بۆ ئەم پۆستە، ئەو تەنها بە حوکمی (واقیع) نەك (قانون)و، بە سوودوەرگرتن لەو گوێڕایەڵیە بەردەوامەی لە ماوەی بیست ساڵ لە لایەن دانیشتوانی (شام)ەوە لێی دەکرا، ئامادە نەبوو بەیعەت بە (عەلی) بداتو فەرمانەکانی لەو وڵاتەدا ڕاپەڕێنێت.[1]

(ابن دحية الكلبي) لە کتێبی (أعلام النصر المبين في المفاضلة بين أهل صفّين)دا دەڵێت: (أبوبكر محمد کوڕی الطيب الأشعري باقلانی) لە باسی سیفەتگەلی ئیمامەکاندا دەڵێت: هەرگیزاوهەرگیز ڕێکەوتنی دوو حەکەمەکە لەسەر لێخستنو دابەزاندنی (عەلی) لە پۆستی (خیلافەت)نەبووە و شتێکی لەم بابەتە ڕووی نەداوە... خۆ ئەگەر ئەوانە بە جووتە یان بە تاك بە گوێرەی ئەو مەرجانەی پێشوەخت لەسەریان دانرابوون هەتا بەڵگەیەکی وایان لە قورئانو سوننەت دەرنەهێنابایە کە واجببوونی لێخرانی دەخاتەڕوو ئەم کارەیان بۆ نەدەکراو سەری نەدەگرت.

دەقی نامەکەی (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) کە ئاراستەی حەکەمەکانی کرد، مەرج لەسەر حەکەمەکان دادەنێت کە: دەبێت حوکم بە کتێبی خودا بکەن لە سەرەتایەوە تا کۆتاییەکەی‌و نابێت لێی دەربچنو سنوور ببەزێننو بە کەیفی خۆیانو نەرمی کێشان (بە لای هیچ لایەنێکدا) ڕەفتار بکەن، بۆ ئەم مەبەستە پەیمانی گەورەی لێ وەرگرتنو هەر کاتێکیش لە حوکم کردنەکەیاندا لە کتێبی خودا دەرچوون ئەوا حوکمەکەیان لێ وەرناگیرێت........، قورئانو سوننەت پشتگیری ئیمامەتیەکەی (عەلی) دەکەنو بە گەورەی دادەنێنو ستایشی دەکەن، شایەتی بۆ دەدەن کە: ڕاستگۆو دادپەروەرە، پێشەواو پێشەنگەو لە دینداریدا خاوەن سابیقەیە، لە جیهادی بتپەرستاندا ڕۆڵی گەورەو جوامێرانەو پاڵەوانانەی گێڕاون، خزمی هەرە نزیکی سەرداری پێغەمبەرانە، خاوەن کەسایەتیەکی تایبەتە لە ئاوەزی بەهێزو زانستی بەرفرەی لە حوکمڕانیدا، شیاوی ئیمامەتو پێشەوایی کردنە، بۆ هەڵگرتنی باری خیلافەت بە تواناو شایستەیە.[2]

---

١ تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة (٢/٢٣٤).

٢ أعلام النصر المبين في المفاضلة بين أهل صفين (ص: ١٧٧).

١١ـ جێگای تێدابەستنی كۆبوونەوەكە:

هەروەك لە پەیماننامەكەدا هاتووە كاتی دیاریكراوی كۆبوونەوەی دوو حەكەمەكە ئەگەر هیچ ئاستەنگ دروست نەبن دەبێت لە ڕەمەزانی ٣٧ی كۆچیدا بێتو، بە گوێرەی ڕیوایەتە متمانەلەسەرەكان لە (دومة الجندل)[١]ی هەڵكەوتووی نێوان شامو عێراق دەبەسترێت، بە گوێرەی چەند ڕیوایەتێكی تریش كە هێندەی ئەوانی پێشدا جێی متمانە نین دەبێ لە (ئەذرەح) ببەسترێت ،[٢] وەك (خەلیفەی كوڕی خیاط) دەڵێت: پێ دەچێت نزیكبوونی ئەم دوو شوێنە لە یەكترەوە كاری كردبێتە سەر جیاوازی ڕیوایەتەكان،[٣] ......... دەشوترێت دەبێ لە (ئەذرەح)ی نزیك (دومة الجندل) بێ، ئەمەو كۆبوونەوەكە لە كاتو شوێنی خۆیداو بەبێ هاتنە پێشی كۆسپێك لە بەردەمیدا ئەنجامدرا.[٤]

بێگومان شوێنی تێدا كۆبونەوەی حەكەمەكان (دومة الجندل) بوو، بەڵام (یاقوت الحموي) سووره لەسەر ئەوەكە لە (ئەذرەح) بوویێتو، بەڵگە بە هەندێك ڕیوایەت (كە ڕوونی نەكردوونەتەوەو) هەندێك هۆنراوە بە تایبەتی بە دوو هۆنراوەی (ذو الرمة)[٥] دەبەستێت، كە تێیاندا مەتحی (بیلالی كوڕی أبی بردە)[٦] دەكات، (ذو الرمة) دەڵێت:

أبوك تلافى الدين والنـاس بعدها تشاءوا وبيت الدين منقلع الكسر

فشد إصـــار الدين أيـــان أذرح ورد حروبـاً قــد لقحن الى عقر[٧]

١٢ـ ئایا (سەعدی كوڕی ئەبی وەقاص) ئامادەی كۆبوونەوەی دوو حەكەمەكە بوو؟:

هەردووك حەكەم لە كاتو شوێنی دیاریكراودا ئامادە بوون، هەریەكەیان چەند سەد كەسێكی وەكو وەفد لەگەڵدا بوو، وەفدێكیان بە نوێنەرایەتی خەڵكی عێراقو ئەوی تریشیان بە نوێنەرایەتی خەڵكی شام هاتبوو، هەردووك حەكەم داوایان لە ژمارەیەك پیاوماقوڵو كەسانی دیاری (قورەیش) كرد (بە مەبەستی ڕاڵێوەرگرتن) ئامادەی كۆبوونەوەكە ببن، ژمارەیەك لە هاوەڵانی پایەدار (بە خاتری ئەوە لە سەرەتای شەڕەكەوە خۆیان بواردبوو) لە

---

١ (دومة الجندل): كەوتووەتە خۆرئاوای شاری (جەوف) لە باكووری نیوەدوورگەی عەرەبی.

٢ (أذرح): ناوی شارۆچكەیەكی سەرسنووری شامە، سەر بە پارێزگای (شەرات)ی دەوروبەری (بەقا)یە.

٣ تاريخ خليفة (ص: ١٩١ـ١٩٢).

٤ خلافة علي بن أبي طالب، عبدالحميد (ص:٢٦٧).

٥ ذي الرمة: غيلات كوڕی عقبة (١١٧ك) مردووە، سير أعلام النبلاء (٢٦٧/٥).

٦ بلاب بن أبي بردة عامر بن أبي موسى الأشعري، تهذيب تاريخ دمشق (٣٢١/٣).

٧ ديوان ذي الرمة (ص:٣٦١، ٣٦٢)، نقلا عن خلافة علي (ص: ٢٧٢).

کۆبوونەوەکەدا ئامادە نەبوون، بەڕێزترین کەسی نێویان ئەم هاوەڵە (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص) بوو، ئەو نە ئامادەی (تەحکیم) بوو، نە گوێی پێدا، نە خوازیاریشی بوو.[١] (عامری کوڕی سەعد) دەگێڕێتەوە کە ڕۆژێك (عومەر)ی برای دەچێتە دەرەوەی مەدینە بۆ لای (سەعد) –کە خۆی بە لەوەڕاندنی مەڕەوە سەرگەرم کردبوو– کە سەعد لە دوورەوە چاوی پێ دەکەوێت دەڵێت: لە بەرانبەر شەڕی ئەو سوارەدا پەنا بە خودا دەگرم، کاتێك دەگاتە لای پێی دەڵێت: ئەی بابی خۆم: ڕازی دەبی لە مەدینەدا خەڵك لەسەر دەسەڵات کێشمەکێش بکەن‌و تۆش لەنێو مەڕەکانتدا ببی بە ڕەوەند؟ (سەعد) کۆڵە مستێکی بە سنگی (عومەر) کێشاو وتی: وسبە، من گوێم لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بوو دەیفەرموو: ((إن الله يُحِبُّ العبد التقي الغني الخفي))[٢] واتە: خودا بەندەی خۆپارێزی زەنگینی نادیاری خۆش گەرەکە.

## حەوتەم: ئایا دەگونجێت بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نێوان دەوڵەتانی ئیسلامی سوود لە ڕووداوی (تەحکیم) وەربگیرێت؟

بێگومان هەر کاتێك سەرۆکانی دەوڵەتانی ئیسلامی باری بەرپرسیاری سەرشانی خۆیان بە جیددی هەڵگرت‌و ئەو گەلانەی حوکمیان دەکەن لە پشتیانەوە بن‌و لە چارەسەرکردنی کێشەکاندا توانیان گوشاریان بخەنە سەرو، ئیدی بە خاتری پێکانی ئامانج پەنا بۆ (تەحکیم)ی شەرعی بەرن‌و هەریەکەیان لە ڕاستخۆیەوە (حەکەم)ێك دیاری بکات، ئەوا (بە ئیزنی خوا) کێشەکانی نێوانیان چارەسەر دەبن، لە ژێر ڕۆشنایی ئەم ڕێنماییانەی خوارەوەدا:

١ـ دیاریکردنی دەسەڵاتی حەکەمەکان بۆ دەرکردنی ئەو ڕستە حوکم‌و بڕیارانەی بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان پێویستن.

٢ـ دانانی (شەریعەتی ئیسلام) وەکو تاکە سەرچاوەیەك بۆ دەرکردنی ئەو حوکم‌و بڕیارانەی چارەسەری کێشەکانیان پێ دەکرێت.

٣ـ وەرگرتنی بەڵێن‌و پەیمان لە هەردووك لایەنی ناکۆك‌و سەرۆکەکانیان کە ڕازی بن‌و گەردنی خۆیان بۆ ئەو حوکم‌و بڕیارە چارەسازە شەرعیانە کەچ بکەن کە لایەن دوو

---

١ خلافة علي بن أبي طالب، عبدالحميد (ص:٢٧٢).

٢ المسند (١/١٦٨)، (احمد شاكر) دەڵێت: سەنەدەکەی (صحيح)ە (٣/٢٦)، خلافة علي بن أبي طالب، للسُلمي (ص: ١٠٧).

حەکەمەکەوە دەردەکرێن، بە جۆرێك کە پەیڕەوکردنو جێبەجێکردنیان بە بەڵگەی شەرعی واجب دەبێتو، نارازیبوونو سەرپێچیکردنی ئەم بڕیارانە گوناهو تاوانی لیّ دەکەوێتەوە.

٤ـ هەرکاتێك حەکەمەکان ئەو حوکمو بڕیارە چارەسازانەیان دەرکردن کە لەسەریان پێکهاتوونو هەردووك لایەنی ناکۆکیش گەردنیان کەچ کردو قایل بوون، ئەوا کێشەکە چارە دەبێتو خودا شەڕو هەرا لە کۆڵ موسڵمانان دەکاتەوە.

٥ـ ئەگەر هەردوو لایەنی ناکۆك، یان یەکێکیان ڕێککەوتنی حەکەمەکانی ڕەت کردەوەو بە حوکمو بڕیارەکانیان قایل نەبوو، ئەوا ئەو لایەنە نەقایلە یەکیان بێت یان هەردووکیان بن،جیاوازی نیە، بە ستەمکار (باغ) دادەنرێت، لە ڕووی (شەرع)ەوە لەسەر هێزە ئیسلامییەکانی ناوچەکە واجب دەبێت هەموو گوشاری خۆیان بخەنە سەر لایەنی ستەمکار تا بڕیارە شەرعیەکانی دوو حەکەمەکە قبوڵ بکات، ئەگەر بزانن کێشەکە زیاتر گەورە نابێتو بارودۆخەکە زیاتر ناشێوێت ئەوا دەبێت هێزی سەربازیش بۆ کۆتایی پێهێنانی کێشەکە بەکاربێنن.

٦ـ دەکریّ بەپێی ڕێکەوتنی هەردوولایەن یەکێك لە دەسەڵاتەکانی دوو حەکەمەکە ئەوە بێت: کە بتوانێت لە پێناوی چارەسەرکردنی کێشەکەداو لە ژێر ڕۆشنایی ئەو ڕێنماییانەی پێشدا باس کران چەند بڕیارێکی تایبەت بە چۆنیەتی هاوردەکردنو بە جموجۆڵخستنی هێزە چەکدارەکانی وڵاتانی ئیسلامی دەربکەن[1]، لەوانەیە ئەگەر بۆ کۆتایی پێهێنانی کێشە نێوخۆییەکانی نێوان وڵاتانی جیهانی ئیسلامی پەنا بۆ ڕێگەچارەیەکی لەم جۆرە ببردرێت، ڕێگە لەبەردەم هەر هێزێکی دەرەکی بێگانە دابخرێت کە بیەوێت بە پاساوی داخوازی یەکێك لە لایەنە ناکۆکەکان خۆ لە کاروباری نێوخۆی موسڵمانان هەڵقورتێنیّو.... پاشان ئەم هەلە بقۆزێتەوەو پیلان لە موسڵمانان بگێڕێتو هێندەی تر بازنەی کێشەکە فراوان بکات، ئەمجا نەخشەیەك بسەپێنێت کە تەنها لە خزمەتی بەرژەوەندییەکانی خۆیدا بێتو دەرەنجام موسڵمانان بە کاریگەری ئەم نەخشەی ئەوەوە بە جۆرێك بکەونە ناڵەو دادو فوغانەوە کە پێش هاتنی ئەم هێزە بێگانە بە دەست ئاشوبە نێوخۆییەکەوە قەت هێندە گرفتار نەبووبن. بێگومان بێگانە کە خۆی دەخاتە نێو بارودۆخەکەوە لەبەر ئەوە نیە کە پەرۆشی موسڵمانانیەتیو بە خەم ناڵەو نرکەیانەوەیە، نەخێر ئەو هەوڵ دەدات ئەم جۆرە کێشە نێوخۆییانەی نێو موسڵمانان پەرە پیّ بدات، تا بێتە نێو بارودۆخەکەوەو ئەو پیلانە

---

[1] الجهاد والقتال في السياسة الشرعية (٣/١٦٦٥).

شومو ڕەشە بەسەر لایەنە ناکۆکەکاندا بسەپێنێت‌و لەم نێوانەدا تەنها خۆی سوودمەند بێت‌و بەس. وتمان: لەوانەیە پەنا بردن بۆ (تەحکیم) کە پێشتر ڕوونکرایەوە ڕێ بە هاتنە ناوەوەی هەمونەو هێزە بیانیانە بگرێ کە بێشك ڕیزی موسڵمانان زیاتر تێکدەدەن، ئەمەو ئەو پابەندبوونە شەرعیەی پەیوەست بەو حوکم‌و بڕیارانەی لە لایەن لیژنەی (تەحکیم) یان ئەو حەکەمەکەوە دەردەچن بەڵگەی بەهێزی (إجماع) واتە کۆدەنگی هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خودا (ﷺ)ی لەسەرە، بێگومان لە کاتی دروستبوونی کێشەی نێوان (عەلی)و (معاویە)دا هەر هەموو هاوەڵان لەسەر (تەحکیم)و قبوڵکردنی پابەندبوونی هەموو لایەك بە بڕیارەکانی یەکدەنگ بوون،.... چ جای ئەو هاوەڵانەی لەگەڵ (عەلی) بوون یان لەگەڵ (معاویە)دا بوون یان بێلایەن بوون (وەکو سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص‌و عبدالله ی کوڕی عومەرو هی تریش) خودا لە هەموویان ڕازی بێت، ئەوان هەر هەموویان سەبارەت بەم پرسە یەکدەنگ بوون.[1]

## هەشتەم: هەڵوێستی ئەهلی سوننەت لە بەرانبەر ئەم جەنگانەدا:

هەڵوێستی ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت لە بەرانبەر ئەو جەنگانەی لەنێوان هاوەڵە بەڕێزەکان (خودا لێیان ڕازی بێت)دا ڕوویداوە هەڵوێستی خۆپاراستنە لە باسکردنی ئەو کێشانەی لە نێوانیاندا هەبووە، دەم تێوەرنەدانە لە شتێك شایستەی شان‌و شەوکەت‌و ڕێزو حورمەتی ئەوان نەبێت، چونکە ئەمە دەبێتە مایەی دروستبوونی دڵایەتی‌و ڕقلێبوونەوەی یەکێك لە دوو لایەنەکە.

دەڵێین: لەسەر هەموو موسڵمانێك واجبە هەموویانی خۆش بوێن‌و بۆیان لە خودا بپاڕێتەوە لێیان ڕازی بێت‌و بیانخاتە ژێر سایەی ڕەحمەتی خۆیەوەو، پارێزگاری ئەو پلەو پایە بەرزەیان بکات کە هەیانبووەو، دان بە سابیقەیاندا بنێت‌و سیفەتە بەرزو ڕەوشتە ڕەندەکانیان بەنێو خەڵکدا بڵاوکاتەوە، دەبێت باوەڕی وابێ ئەوەی لەنێوانیاندا دروست بووە بەرهەمی (ئیجتیهاد)ی خۆیان بووەو، هەر هەمووشیان لە حاڵەتی پێکان‌و نەپێکاندا پاداشتیان بۆ نووسراوەو بەڵام پاداشتی ئەوەی پێکاویەتی دووچەندانەی پاداشتی ئەو کەسەیە نەیپێکاوەو، بکوژو کوژراوەکانیان بەهەشتین.

بەم شێوەیە ئەوان ڕێگەنادەن دەم لە باس‌و خواسی ناکۆکیەکانی نێوان هاوەڵان وەربدرێت، بەر لەوە کۆمەڵێك وتەی (ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت) سەبارەت بەم بابەتە

---

[1] المصدر نفسه.

بخەمەڕوو، ژمارەیەك لەو دەقانە دەخەمەڕوو کە ئاماژە بە ڕوودانی ناکۆکی‌و جەنگی نێوان هاوەڵان دەکەن، لەو دەقانە:[١]

١ـ خوای بەرز دەفەرمووێت: ﴿وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا ۖ فَإِنۢ بَغَتْ إِحْدَىٰهُمَا عَلَى ٱلْأُخْرَىٰ فَقَٰتِلُوا۟ ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن فَآءَتْ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا بِٱلْعَدْلِ وَأَقْسِطُوٓا۟ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٩﴾﴾[٢]، واتە: ئەگەر هاتو لە نێو ئیمانداراندا دوو تایەفە شەڕیان کرد، یەکسەر صوڵح لەنێوانیاندا بکەن‌و ئاشتیان بکەنەوە، ئەگەر لایەکیان وازی نەدێناو ستەمی لە لایەکەی تر دەکرد، ئێوەش (هەمووتان) شەڕ لەگەڵ ئەو لایەنە بکەن کە دەستدرێژی دەکات، هەرکە گەڕایەوە دادپەروەرانە صوڵح لە نێوانیادا بکەن، دادپەروەر بن، چونکە خودا دادپەروەرانی خۆش دەوێن.

لەم ئایەتەدا: خودای بەرز فەرمان دەکات هەر کاتێك جەنگو هەرا لە نێوان موسڵماناندا ڕوویدا بە حوکمی ئەوە کە برای یەکترن دەبێ صوڵحیان لە نێواندا بکرێت، ئەم جەنگانەی نێوانیان لە بازنەی ئیمانیان دەرناکەن، چونکە خودای پاك‌و بێ خەوش ناوی لایەنە شەڕکەرەکانی بە (ئیماندار) هێناوەو فەرمانیداوە ئاشت بکرێنەوە، جا ئەگەر کوشتارێك خەڵکانی ئیماندار بە گشتی لە بازنەی (ئیمان) بەدەر نەنێت، ئەوا خەڵکانی تایبەتی وەکو هاوەڵانی پێغەمبەری خوداش (ﷺ) کە لە جەنگی (جەمەل)و جەنگەکانی دواتردا بەشداری کوشتاریان کردووە لە بازنەی ئیمان بەدەرنانێ، ئەوان وەکو لە ئایەتەکەدا هاتووە یەکەمین کەسانێکن ناویان بە ئیماندار هاتووەو بۆ هەمیشەش بە لای پەروەردگاریانەوە ئیمانداری ڕاستەقینەن‌و ئەوەی لە نێوانیشیاندا هاتووەتە ئاراوە بە حوکمی ئەوەی بە (ئیجتیهاد) بووە تۆزقاڵێك کاریگەری ناهەمواری لەسەر ئیمانەکەیان دروست نەکردووە.[٣]

٢ـ لە (ئەبو سەعیدی خودەری)یەوە (خودا لێی ڕازی بێت) وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: ((تمرُقُ مارقة عند فرقة من المسلمين، تقتلهم أولى الطائفتين بالحق))[٤]، (واتە: لە سەرودەمێکدا کە موسڵمانان پەرتەوازەن، تاقمەیەك لە دژی جەماعەت دەردەچن، یەك لە

---

١ عقيدة أهل السنة والجماعة في الصحابة الكرام (٢/٧٢٧)، تنزيه لخال المؤمنين (معاوية) بن أبي سفيان (ص: ٤١).

٢ الحجرات (٩).

٣ العواصم من القواصم (ص: ١٦٩، ١٧٠)، أحكام القرآن (٤/١٧١٧).

٤ مسلم (٢/٧٤٥).

نوو تاقمە (ناکۆکەکە) کە لە هەق نزیکترە شەڕیان لەگەڵ دەکات‌و دەیانکوژێت). ئەو (پەرتەوازەیی)یە کە لە نێو فەرموودەکەدا ئاماژەی بۆ کراوە بریتیە لە ناکۆکیەکەی نێوان (عەلی)و (معاویە) (خودا لێیان ڕازی بێت)، لەگەڵ ئەوەشدا کە ناکۆکن پێغەمبەر (ﷺ) بە جۆرێك وەصفیان دەکات کە: ئەوان هەردوو لایان موسڵمانن‌و بە هەقەوە پەیوەستن، فەرموودەکە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی، پێغەمبەری خودا (ﷺ) چۆن هەواڵی داوە ڕووداوەکەش کتومت هاتەدی، هەروەها فەرموودەکە: حوکم دەدا کە هەردوو تایەفەی ناکۆك هەم خەڵکی شام‌و هەم خەڵکی عێراق موسڵمانن، بە پێچەوانەی فیرقەی (ڕافیزە)و (نەفامگەل) کە خەڵکی (شام) کافر دەکەن، هەروەها هەواڵ دەدا کە هاوەڵانی (عەلی) لە هەقەوە نزیکترن، ئەمە مەزهەبی ئەهلی سوننەت‌و جەماعەتە کە: (عەلی) پێکاویەتی‌و ئەگەرچی (معاویە)ش (موجتەهید) بووەو (إن شاء الله) پاداشتیشی بۆ نوسراوە، بەڵام (عەلی) ئیمام‌و پێشەوا بووەو بە گوێرەی ئەو فەرموودەیەی کە لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە دوو پاداشتی بۆ نوسراوە: ((إذا إجتهد الحاكم فأصاب فله أجران، وإذا إجتهد فأخطأ فله أجر))[1] واتە: ئەگەر حاکم ئیجتیهادی کردو پێکای دوو پاداشتی دەست دەکەوێت، ئەگەر ئیجتیهادی کردو نەیپێکا یەك پاداشتی دەست دەکەوێت.

٣ـ لە (أبي هريرة)ەوە، وتی: پێغەمبەر (ﷺ) وتاری دەداو (حەسەن) هات، پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: ((إبني هذا سيد، ولعل الله أن يصلح به بين فئتين من المسلمين))،[2] واتە: ئا ئەم کوڕەی من سەروەرە، ئومێدەوارم خودا بە هۆی ئەوەوە نێوانی دوو لایەنی (ناکۆك)ی موسڵمانی پێ چاك بکاتەوە. لەم فەرموودەدا: پێغەمبەر (ﷺ) شایەدی ئیسلامەتی بۆ هەردوو لایەنەکە (خەڵکی شام‌و خەڵکی عێراق) دەدات، ئەمە بەرپەرچدانەوەی ئاشکرای ئەو (خەواریج)انەی لەخۆگرتووە کە (عەلی)و هاوەڵانی‌و (معاویە)و هاوەڵانییان بە کافر دادەنا، لەبەر ئەمە (سوفیانی کوڕی عویەینە) دەڵێت: ئەم وتەیەی: (فئتين من المسلمين) دوو تاقم لە ڕیزی موسڵمانان بە چاکی سەرسامامان دەکات، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) هەر هەمووی بە موسڵمان ناوبردوون، ئەمە هەواڵدانێکە لە لایەن

١ البخاري، مع شرحه في فتح الباري (٣١٨/١٣).

٢ البخاري، كتاب الفتن، رقم (٧١٠٩).

پێغەمبەری خودا (ﷺ)ەوە کەوا (حەسەنی کوڕی عەلی) دوابەدوای وەفاتی (عەلی) پۆستی خیلافەت ڕادەستی (معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان) دەکات.[١]

ئەو فەرموودانەی خرانەڕوو ئاماژە دەدەن بە (خەڵکی عێراق) کە لەگەڵ (عەلی) بوون‌و بە خەڵکی (شام) کە لەگەڵ (معاویە) بوون، پێغەمبەر (ﷺ) بەو چەشنە وەسفیان دەکات کە لە ئوممەتی خۆنی‌و[٢]... تێکرایان پەیوەستن بە هەقەوەو لێی دەرنەچوون، هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) گەواهیان بۆ دەدا کە ئەوان لەسەر ئیمانەکەیان بەردەوامن‌و بە هۆی ئەو جەنگ‌و کوشتارەی لە نێوانیاندا دروست دەبێت لەو بازنەیە دەرناچن‌و دەچنە بەر حوکمی گشتی ئەم فەرموودەی خوای بەرز: ﴿وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱقۡتَتَلُواْ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَا﴾[٣].

پێشتر وتمان: ئایەتەکە بە یەك چاو ئاماژە بۆ هەردولایان دەکات، کە ئەوان بە کوشتاری نێوانیان نە کافر بوون، نە فاسق بوون، بەڵکو ئەوان موجتەهیدو تەئویلکار بوون، بینیمان کە چۆن (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) حوکمی جەنگکردنی لەگەڵ ئەواندا ڕوونکردەوە!، کەواتە موسڵمان لەسەری واجبە سەبارەت بە ئەو ڕووداوانەی لە نێوان هاوەڵە بەڕێزەکان (خودا لێیان ڕازی بێت)دا دروست بوون ڕێبازی تاقمە ڕزگاربووەکە (ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت) بگرێتەبەرو عەقیدەی خۆی ساغ‌و سەلیم بکات‌و خۆ لە باسکردنی کێشە دروستبووەکانی نێوانیان کە ڕوویانداوە ببوێرێت‌و دەم لە شتێك وەرنەدات کە شایستەی پایەداری ئەوان نەبێت، (ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت) لە کتێبەکانی خۆیاندا بە تێرو تەواوی عەقیدەو بیروباوەڕی پاك‌و پوختی خۆیان لە بەرانبەر ئەو پۆلە هەڵبژاردەی یەکەمە خستۆتەڕوو و بە وتە ڕازاوەو شیرینەکانی خۆیان هەڵوێستی خۆیان لە بەرانبەر جەنگەکانی نێوانیان دەربڕیوە،[٤] لەو وتە نازدارانە:

١ـ (عومەری کوڕی عبدالعزيز) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) سەبارەت بەو جەنگەی لە نێوان هاوەڵاندا ڕوویداوە پرسیاری لێکرا، لە وەڵامدا وتی: ئەمە خوێنێك بوو خودا دەستەکانمی لەئاست ڕژانیدا بە پاك ڕاگرت، جا چۆن زمانمی تێدا بەکاردەهێنم‌و بە پاکی ڕاناگرم، هاوەڵانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) وێنەی چاوەکانن، دەرمانیان دەست لێ نەدانیانە.[٥]

---

١ الاعتقاد للبيهقي (ص: ١٩٨)، فتح الباري (٦٦/١٣).

٢ لە (صحیحی موسلیم) (٧٤٦/٢)دا بەم دەربڕینە هاتووە: (تكون في أمتي فرقتان).

٣ الحجرات (٩).

٤ عقيدة أهل السنة في الصحابة (٧٣٢/٢).

٥ الانصاف للباقلاني (ص: ١٦)، الطبقات (٣٩٤/٥).

(بەیهەقی) لە پەراوێزی ئەم وتەیەی (عومەری کوڕی عبدالعزیز)دا دەڵێت: ئەمە شتێکی جوانو چاکە، چونکە بێدەنگبوونی مرۆڤ سەبارەت بە شتێك پەیوەندی بە ئەوەوە نیە ئەوە تەواوەو ئامانجهەنگێوە.[1]

٢ـ (حەسەنی بەصری) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) سەبارەت بە کوشتاری نێوان هاوەڵان پرسیاری لێکرا، لە وەڵامدا وتی: جەنگێك بوو هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) ئامادەی بوونو ئێمەش لەوێ نەبووین، ئەوان زانا بوون ئێمە نەزان بووین، یەکگرتوو بوون، بە دوایان کەوتین، ناکۆك بوونو ئێمەش وەستاین (لە باسکردنیان)،[2] واتای وتەکەی (حەسەن) بەم شێوەیە: هاوەڵان سەبارەت بەو بارودۆخانەی تێی کەوتوون لە ئێمە شارەزاتر بوون، ئێمە تەنها ئەوەمان لەسەر واجبە: کە لەسەر هەر شتێك کۆك بوون شوێنیان بکەوین، دەربارەی ناکۆکیەکانی نێوانیشیان بێدەنگ بوەستینو لە خۆمانەوە ڕایەك دانەتاشین، ئێمە ئەوەندە دەزانین کە ئەوان ئیجتیهادیان کردووەو مەبەستیان پێ خودا بووە ، هەموو ئەمە بە خاتری ئەوەیە ئەوان لە بەرانبەر دین ودینداریدا هیچ تۆمەتیان نەدراونەتە پاڵ.[3]

٣ـــ (جەعفەری کوڕی محمدی صادق): سەبارەت بە ڕووداوەکانی نێوان هاوەڵان پرسیاریان لێکرد، لە وەڵامدا وتی: ئەوە دەڵێم کە خودا لەسەر زمانی (موسا) دەفەرموێت: ﴿قَالَ عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي فِي كِتَٰبٍۖ لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى ﴿٥٢﴾﴾[4] واتە: وتی: زانیاری ئەمە لە لای پەروەردگارمە، لە کتێبێکدا هەڵی گرتووە، پەروەردگارم لە بەرانبەریدا نە سەری لێ دەشێوێتو نە لە بیریشی دەچێتەوە.[5]

٤ـ ئیمام ئەحمەد (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دوای ئەوە پێی وترا: دەربارەی ئەوەی لە نێوان (عەلی)و (معاویە)دا هەبوو چ دەڵێی؟ وتی: جگە لە چاکە هیچیان دەربارە نالێم.[6] لە (ئیبراهیمی کوڕی ئازەری مەقیە)وە، وتی: لە لای (أحمدی کوڕی حەنبەل) بوومو پیاوێك دەربارەی ڕووداوەکەی نێوان (عەلی)و (معاویە) پرسیاری لێکرد؟ ئەویش ڕووی لێ وەرگێڕا، جا پێی وترا: ئەی (ئەبو عەبدوڵڵا) ئەو پیاوە لە زنجیرەی خانەدانی (بەنی هاشم)ە ڕووی تێ

---

١ مناقب الشافعي (ص: ١٣٦).
٢ الجامع لأحكام القرآن (١٦/٣٣٢).
٣ المصدر نفسه (١٦/٣٣٢).
٤ طه (٥٢).
٥ الانصاف للباقلاني (ص: ١٦٠).
٦ مناقب الإمام أحمد، لإبن الجوزي (ص: ١٦٤).

بکە، وتی: ئەم ئایەتە بخوێنــەوە: ﴿تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلَا تُسْـَٔلُونَ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٤١﴾﴾[1] واتە: ئەمە ئوممەتێك بوو ڕابورد، پاداشـتی کـردەوەی چـاکی خـۆی بـۆ خۆیەتی‌و پاداشتی کردەوەی چاکی ئێوەش بۆ خۆتانە، ئێوە دەربارەی ئەو کاروکردەوانـەی ئەوان ئەنجامیاندا پرسیارتان لێ ناکرێت‌و یەخەگیر نابن.

٥ـ (إبن أبي زيد القرواني) لـەو بابەتەیـدا کـە پێویستە موسـڵمان عەقیـدەو بیروبـاوەڕی دەربارەی هاوەڵانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) چۆن بێت‌و پێویستە بـە چ دەربڕینێـك باسـیان بکرێـت، دەڵێـت: نابێـت کـەس باسـی هـاوەڵانی پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) بکـات مەگـەر بـە جوانترین دەربڕین نەبێت، دەبێت خـۆ ببوێرێـت لـە باسـکردنی ئـەو ڕووداوە ناخۆشـانەی لـە نێوان ئەواندا ڕوویداوە، (هاوەڵان) لە هەموو خەڵك شایانترن بۆ ئەوەی پاساو و بەهانەیان بۆ بێنینەوەو جوانترین گومانی چاکەیان پێ بەرین.[2]

٦ـ (أبو عبدالله بن بطة) لە کـاتی خـستنەڕووی عەقیـدەی ئـەهلی سـوونەت‌و جەماعەتـدا دەڵێت: لە دوای ئەمە واز لە باسکردنی ناکۆکی‌و ناتەباییەکانی نێـوان هـاوەڵانی پێغەمبـەری خودا (ﷺ) دێنین، ئـەوان لەگـەڵ پێغەمبـەر (ﷺ) ئامـادەی هـەموو ڕووداوەکـان بـوون، لـە فەزڵ‌و چاکەدا پێش هەموو خەڵکیان داوەتەوە، چاك بزانە خودا لێیان خۆش بووەو فەرمانی پێکردووی نزای لێخۆشبوونیان بۆ بکەی‌و بە هۆی خۆشویستنی ئەوانەوە خۆت لە خودا نزیك بکەیتەوە، خودا ئەمەی لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی واجب کردووە، ئەمـە لـە کاتێکدا کـە زاتی موبارەکی دەیزانی لەمەولا چ شـتێك لـە نێوانیانـدا دروسـت دەبێـت‌و شـەڕیش دەکـەن، بێگومـان ئـەوان پایـەیان بەسـەر تێکـڕای خەڵکدا بەرزکراوەتـەوە، هەرچـی گونـاهێکی بـە قەستی‌و بە هەڵە کردبێتیان لەسەریان لابراوەو خودا لە هەموو ئەو ناکۆکیانەیان خۆش بووە کە لە نێوانیاندا ڕوویانداوە.[3]

٧ـ (أبوبکر بن الطیب الباقلاني) دەڵێت: واجبە بزانرێت: کە دەبێت خۆ بپارێزین لە باسکردنی ئەو ناکۆکیەی لە نێوان هاوەڵان (خودا لێیان ڕازی بێت)دا ڕوویداوەو ڕەحمەتی خودا بۆ هەموویان بنێرین‌و ستایشیان بکەین‌و ڕەزامەندی‌و چەپاڵەدان‌و سەرفرازی‌و بەهەشتیان بۆ لە خودا داوا بکەین، دەبێت باوەڕمان بەوە بێت کە (عەلی) (علیه السلام)

---

١ البقرة (١٤١).

٢ رسالته المشهورة مع شرحتها (الثمر الداني) (١٥٢)، (ص: ٢٣).

٣ الشرح والإبانة على أصول السنة والديانة (ص: ٢٦٨).

ـەوەی ئەنجامی داوە پێکاویەتی‌و دوو پاداشتی بۆ هەیە، ئەو کردارانەی لە لایەن هاوەڵان خودا لێیان ڕازی بێت)ەوە دەرچوون بە ئیجتیهاد بووەو پاداشتیان بۆ هەیەو نە فاسق ـونو نە تووشی بیدعە بوون بە بەڵگەی فەرموودەی خوای بەرز: ﴿لَّقَدْ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِى قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾﴾[1] ـاتە: بەڕاستی خودا لەو ئیماندارانە ڕازی بوو، کە لە ژێر درەختەکەدا بەیعەتیان پێ دەدای، خودا دەیزانی چ شتێك (لە دڵسۆزی‌و فیداکاری) لە دڵیاندایە، جا ئارامی‌و ئۆخژنی بەسەردا ـڕژاندن‌و بە دەستکەوتی سەرکەوتنێکی زۆر نزیك پاداشتی دانەوە، هەروەها بە بەڵگەی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ): ((إذا إجتهد الحاكم فأصاب فله أجران، وإذا إجتهد فأخطأ فله ـجر))،[2] جا ئەگەر حاکم‌و فەرمانڕەوای سەردەمی ئێمە لەسەر ئیجتیهادەکەی دوو پاداشتی ـۆ بنووسرێت، کەواتە دەبێ گومانت لە بەرانبەر ئیجتیهادی ئەو کەسانەدا چۆن بێت کە خودای بەرزو مەزن لێیان ڕازی بووەو ئەوانیش لە ئەو ڕازی بووبن؟!، ئەو فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) سەبارەت بە (حەسەن) فەرمووی دەبێتە بەڵگەی ڕاست‌و دروستی ئەم قسانەمان: ((إبني هذا سيد، ولعل الله أن يصلح به بين فئتين من المسلمين))[3]، واتە: ئەم کوڕەی من سەیدو سەروەرە، لەمەولا خودا بە هۆی ئەوەوە صولح لە نێوان دوو کۆمەڵی گەورەی موسڵمانان دەکات، فەرموودەکە: مەزنایەتی بۆ هەردوو تایەفەکە بەرقەراردا، حوکمی ڕاست‌و دروستی ئیسلامەتی بۆ دەرکردن، خودا بەڵێنی بە ئەو جیلە داوە ڕق‌و قینوبوغزوغەرەز لە دڵ‌و دەروونیان دارنێت، بە بەڵگەی ئەم ئایەتە پیرۆزە: ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِى صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ إِخْوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٤٧﴾﴾[4] واتە: هەرچی ڕق‌و قینە هەیە لە سینگی ئەوانمان دارنیوەو بە برایانەو بەرانبەر بە یەکتری لەسەر قەنەفە ئاوریشمین‌و زێڕو زیو کفتەکانی بەهەشت دادەنیشن،....... تا ئەوەی دەڵێت: پێویستە لەسەرمان خۆمان لە ئاستی باس‌و خواسی ناکۆکیەکانی نێوانیان بپارێزین‌و لێی بێ دەنگ بین.[5]

---

١ الفتح (١٨).
٢ البخاري مع شرحه في فتح الباري (٣١٨/١٣).
٣ البخاري، كتاب الفتن (رقم: ٧١٠٩).
٤ الحجر (٤٧).
٥ الانصاف فيما يجب إعتقاده ولا يجوز الجهل به (ص: ٦٧ـ٦٩).

٨ــ (إبن تیمیة) لە باسی (بیروباوەڕی ئەهلی سوننەتو جەماعەت لەسەر ئەو ناتەباییانەی لە نێوان هاوەڵاندا ڕوویانداوە) دەڵێت: (ئەهلی سوننەتو جەماعەت) لە ئاست ناکۆکیەك کە لە نێوان هاوەڵاندا ڕوویداوە خۆ دەپارێزنو دەڵێن: ئەم ڕیوایەتو حیکایەتانەی سەبارەت بە خراپ پیشاندانی ئەوان هاتوون: هەیانە درۆیە، هەیانە پێیەوە زیادکراوە، هەشیانە لێی کەم کراوەتەوەو ڕووە ڕاستەکەی شێوێنراوە، ئەوەی ڕاستو دروستیش بێت، ئەوە ئەوان لە بەرانبەریدا بەهانەوپاساویان هەیە، یان موجتەهیدانێك بوون پێکاویانە، یان موجتەهیدانێك بوونو هەڵەیان کردووە.[١]

٩ـ (إبن کثیر) دەڵێت: بەڵام ئەوەی دوای وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) لە نێوان هاوەڵاندا هاتەئاراوە: هەرای وا هەبووە بەبێ مەبەست ڕوویدا وەکو (جەنگی جەمەل)، هەبووە بەپێی ئیجتیهاد دروست بووە، وەکو (جەنگی صەفین)، هەرچی ئیجتیهادکردنیشە یان دەپێکێت یان هەڵە دەکات، بەڵام خاوەنەکەی عوزرو بەهانەی وەردەگیرێتو پاداشتیشی بۆ دەنووسرێت، بەڵام ئەوەی لە ئیجتیهادەکەیدا دەپێکێت دوو پاداشتی بۆ دەنووسرێت.[٢]

١٠ـ (إبن حجر) دەڵێت: (ئەهلی سوننەتو جەماعەت) ڕێکەوتوون لەسەر ئەوە: کە واجبە تانەو تەشەردان دەرهەقی هەریەکێك لە هاوەڵان بە هۆی ڕوودانی ناکۆکیەکانی نێوانیانەوە قەدەغە بکرێ، خۆ ئەگەر زانراش کامیان لەسەر هەقەو کامیان لەسەر ناهەقە ئەوا هەر دەبێت ڕێگە لەبەردەم ئەم تانەو تەشەرانە بگیرێت، چونکە ئەوان بەبێ ئیجتیهاد نەچوونە نێو گۆڕەپانی ئەو جەنگانەوە، بە دەقی فەرموودە چەسپاوە کەکەسێك لە ئیجتیهادەکەیدا هەڵەی کرد پاداشتێکی بۆ دەنووسرێت، ئەو کەسەش ئیجتیهادی کردو پێکای دوو پاداشتی بۆ دەنووسرێن.[٣]

(ئەهلی سوننەتو جەماعەت) بە کۆی دەنگ بێ دەنگ بوونو باسنەکردنی ئەو ئاشووبانەی لەدوای کوژرانی (عوسمان) لەنێوان هاوەڵان (خودا لێیان ڕازی بێت)دا ڕوویداوە بە واجب دادەنێنو دەڵێن پێویستە ڕەحمەتیان بۆ بنێردرێتو پارێزگاری لە کردەوە چاكو سیفەتە شکۆدارەکانیان بکرێتو دان بە سابیقەیی و پێشەنگیەکانیاندا بهێنرێتو گوفتارو ڕەفتارەجوانو شیرینەکانیان بڵاوبکرێنەوە ، خودا لێیان ڕازی بێتو ڕازیشیان بکات.[٤]

---

١ العقيدة الواسطية مع شرحها لمحمد خليل هراس (ص: ١٧٣).

٢ الباعث الحثيث (ص: ١٨٢).

٣ فتح الباري (١٣/٦٣٤)، عقيدة أهل السنة (٢/ ٧٤٠).

٤ عقيدة أهل السنة (٢/ ٧٤٠).

## نۆیەم: کەوتنی تای تەرازوو بە لای بەرژەوەندیەکانی (معاویە)دا لە دوای جەنگی (صەفین):

دوابەدوای جەنگی (صەفین) تای تەرازوو بە لای بەرژەوەندیەکانی (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت)دا کەوت، بە جۆرێك تاقمەی (خەواریج) بە هەڵگەڕانەوەی لایەکی لە سوپای (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) کردەوەو، دوایەش (عەلی) بە جەنگو کوشتاری ئەوانەوە سەرقاڵ بوو، ئیتر لەم نێوانەدا بە تایبەتی دوای کۆتایی هاتنی (تەحکیم)و نەگەیشتن بە چارەسەری ڕیشەیی، قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی (معاویە) بەرەو فراوانیو بەهێزی دەڕۆیشت، ئەو (خودا لێی ڕازی بێت) بە نهێنیو ئاشکرایی‌و بە بەکارهێنانی ئامڕازو هۆکاری جۆراوجۆر کاری لەسەر لاوازکردنی بەرەی (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران (خودا لێی ڕازی بێت) دەکرد، بۆ ئەمە هەلی ناکۆکی‌و لێکترازانی ڕیزەکانی سوپاکەی(علی) قۆستەوەو سوپایەکی بە سەرکردایەتی (عەمروی کوڕی عاص) (خودا لێی ڕازی بێت) بەرەو (مصر) بەڕێکردو دەستی بەسەردا کێشاو خستیە سەر دەسەڵاتی خۆی، چەند شتێك یارمەتیدەری ئەم داگیرکردنە بوون، لە نێوانیاندا:

١ـ سەرقاڵبوونی (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران بە (خەواریج)ەوە.

٢ـ (محمدی کوڕی ئەبوبەکر)ی کاربەڕێوەبەری (عەلی) لە (مصر) لە بواری بەڕێوەبردن‌و فێڵی سیاسیدا بە قەد (قەیسی کوڕی سەعدی ساعیدی ئەنصاری)ی کاربەڕێوەبەری پێش خۆی بە توانا نەبوو، ئەو لەگەڵ خوازیارانی تۆڵەی خوێنی (عوسمان) کەوتە جەنگەوەو، وەکو (قەیس) بە سیاسەت ڕەفتاری لەگەڵ نەکردن‌و دەرەنجام شکستیان دەرخوارد دا.

٣ـ ڕێکەوتنی (معاویە) لەگەڵ خوازیارانی تۆڵەی خوێنی عوسمان لە بیروڕادا، ئەمە یارمەتی دا دەست بەسەر مصردا بگرێت.[1]

٤ـ دووربوونی (مصر) لە مەڵبەندی خیلافەتی (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران (خودا لێی ڕازی بێت)و نزیکبوونی لە (شام).

٥ـ سروشتی جوگرافیاکەی: ڕێگای (سینا) بریتیە لەو ئاڵقەبەندە سروشتیەی خاکی (مصر) بە خاکی (شام)ەوە دەبەستێتەوە، بەمە (مصر) هێزێکی زۆرو گەورەی مرۆیی‌و ئابووری بۆ (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) زیادکرد، بە هەمان شێوە (معاویە) نوێنەرەکانی خۆی بەرەو باکووری نیوەدوورگەی عەرەبی‌و مەککەو مەدینەو یەمەن بەڕێکردن، بەڵام

١ الطبقات (٣/ ٨٣)، خلافة علي لعبدالحمید (ص: ٣٥١)، بسند صحیح.

هێندەی نەخایاند ئەم نوێنەرانە بە گەیشتنی كەسانێك لە لایەن (عەلی)یەوە بۆ ئەو ناوچانە بە ناچاری پشتاوپشت‌و بە كوێدا هاتبوون بەوێدا گەڕانەوە،[1] (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) بە خاتری ڕاكێشانی سەرۆك‌و پیاوماقوڵانی نێو هۆزەكان‌و كاربەڕێوەبەرانی (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) بە لای خۆیدا دەستی بەكار كرد، هەوڵیدا (سەعدی كوڕی قەیس)ی كاربەڕێوەبەری (عەلی) لە (مصر) بە لای خۆیدا كەمەندكێش بكات، بەڵام نەیتوانی، بەڵام لە دواییدا توانی وای لێ بكات ڕاوێژكارو خەڵكانی دەوروبەری (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) گومانی لەسەر پەیدا بكەن‌و وا لە (عەلی) بكەن لێی بخات.[2] ئیدی لێخرانی (سەعد) لە پۆستی ویلایەتی (مصر) بوو بە دەستكەوتێكی گەورەی معاویە، بە هەمان جۆر هەوڵیدا (زیاد بن ابیە)ی والی عەلی لە (فارس) بە لای خۆیدا ڕاكێشێت، بەڵام ئەو هەوڵەشی سەری نەگرت،[3] ئەمەو (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) لە ڕێی ئەو موژدەو بەڵێنانەی دەیدان‌و بە هۆی ڕێكخرانی كاروبارەكانی خۆی لە لایەك و لێكترازانی كاروبارەكانی (عەلی) لە لایەكی ترەوە توانی كاریگەری لەسەر ژمارەیەك لە سەرۆكهۆزو والیەكانی (عەلی) دابنێت‌و بە لای خۆیدا ڕایانكێشێت.

(عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) لە وتارێكیدا دەڵێت: بە ئاگابن: (بسری كوڕی أبی أرطأة) لە لایەن (معاویە)وە بەڕێكەوتووە: تەنها ئەوە دەبینم كە ئەو خەڵكەی گەڵ (معاویە) بە هۆی گردبوونەوەیان لە دەورەی ناهەقی خۆیان‌و، بڵاوەكێنەتان لە دەورەی هەقی خۆتان‌و، فەرمانبەرداریان لە ئەمیرەكەیان‌و سەرپێچیتان لە ئەمیرەكەتان‌و، بە گەیاندنەجێی سپاردەكانیان‌و، بە ناپاكیتان دەرهەق بە سپاردەكانتان، ڕۆژێك دادێ بەسەرتاندا سەردەكەون، فلانكەسم كردە كاربەدەست‌و غەدرو خیانەتی ئەنجامداو سامانەكەی پاشقولداو لەگەڵ خۆی بۆ معاویەی برد، یەكێكی تریشم كردە كاربەڕێوەبەرو بە هەمان جۆر غەدرو خیانەتی كردو پارەكەی بە كۆڵ داداو بۆ معاویەی برد، كار بەوە گەیشتووە ئەگەر یەكێك بكەمە ئەمیندار بەسەر پەرداخێكەوە دەترسم پەیوەندی پێیەوە هەبێت، خودایە ڕقم لێیانەو ڕقیان لێمە، ئەوانەم لە یەخەكەوەو منیان لە یەخە كەوە.[4]

---

١ تاريخ خليفة (ص: ١٩٨) بدون سند.

٢ ولاة مصر (ص: ٤٥ـ٤٦).

٣ الاستيعاب (٢/٥٢٥، ٥٢٦).

٤ التاريخ الصغير (١/١٢٥)، بسند منقطع.

(عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) لە بەرانبەر ئەم هەموو موصیبەت و تەمبەڵی و ڕۆکەوتن و بەزینانەی خەڵکانی گەڵی کۆڵی نەداو ئەوپەڕی توانای خۆی لەو زانست و ڕەوانبێژی و زمانپاراویەی پێی بەخشرابوو بۆ بەرزکردنەوەی هیمەتی سوپاکەی بەگەڕخست، هەموو ئەو وتارە گەرم و گوڕو پڕجۆش و خرۆش و کاکڵەدارە بەناوبانگانەی بە سەرچاوەی کەلەپور (ی زمانی عەرەبی) دادەنرێن، لە ئەنجامی بێ کاری و دەستبەتاڵی و خەون و خەیاڵاتەوە نەیگوتوون، بەڵکو لە واقیعێکی تفت و تاڵ و پڕئێش و ئازارەوە دەریبڕیون و ئەدای کردوون، لە کتێبی (أمیر المؤمنین علي بن أبي طالب -رضي الله عنه-)دا هەندێك لەو وتانەم خستوونەڕوو.[1]

## دەیەم: پێکهاتنی نێوان (عەلی)و (معاویە) (خودا لێیان ڕازی بێت):

وێڕای بەگەڕخستنی ئەو هەموو هەوڵ و کۆششانەی و بەخشینی بەشێکی زێڕینی تەمەنی خۆی، بەڵام (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) نەیتوانی ئەوە بەدەست بخات کە دەیەویست و مەبەستی بوو، ئەو بە هۆی ئەو پەرتەوازەیی و کەلێنە گەورەی لە ڕیزی سوپاکەیدا دروست بوو، نەیتوانی بەرەو (مصر) پێشڕەوی بکات و دەستی بەسەردا بگرێتەوە، لەبەر ئەمە بە ناچاری و لە ساڵی چلی کۆچیدا لەگەڵ (معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان) (خودا لێی ڕازی بێت) پێکهات کە: (عێراق) بۆ ئەوەو (شام)یش هی (معاویە)و، نابێت هیچ کامێکیان دەست بخاتە نێو کاروباری ئەوی تریانەوەو هێرشی سەربازی بکاتە سەر وڵاتی ژێر دەسەڵاتیەوە.[2]

(الطبري) لە مێژووەکەیدا دەڵێت: لەم ساڵەدا (٤٠ك) پاش نامەو نامەکاریەك کە سەبارەت بە ڕاگرتنی جەنگی نێوانیان هاتبووە ئاراوەو کتێبەکە بە باسکردنیان درێژدەبێتەوە (عەلی)و (معاویە) (خودا لێیان ڕازی بێت) لەسەر چەند خاڵێك پێکهاتن و گەیشتنە یەکتری: (عێراق) هی (عەلی)یە، (شام) هی (معاویە)یە، هیچ کامێکیان دەست لە کاروباری نێوخۆی هاوەڵەکەی وەرنادات و بە سوپا پەلاماری خاکی ژێردەسەڵاتی نادات و داگیری ناکات.[3] بەڵام وەکو دەبینین ئەم (پێکهاتنە) درێژەی نەکێشاوەو هەر لەو ساڵ و سەرودەمەی (عەلی) (خودا لێی

---

١ سيرة أمير المؤمنين علي بن أبي طالب (٢/ ١٠٢٠).
٢ تاريخ الطبري (٦/ ٥٦)، خلافة علي، عبدالحميد (ص: ٢٥٦).
٣ المصدر نفسه (٦/ ٥٦).

ڕازی بێت)ی تێدا شەهیدکراوە، (معاویە) سوپایەك بە سەرکردایەتی (بوسری کوڕی ئەرتەئە) بەرەو (حیجان)و (یەمەن) بەڕێ دەکات.[1]

## یازدەیەم: شەهیدکرانی (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران و چۆنیەتی پێشوازیکردنی ئەم هەواڵە لە لایەن (معاویە)وە:

کاتێك (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) سەرنجی دا سوپاکەی تووشی بەزینو داڕوخان بووە، نەیتوانی هێزێکی وایان لێ ساز بکاتو ئەو ئامانجانەیان پێ بێنێتەدی کەمەبەستی بوون، ئیتر خۆشی لە دونیا نەدەهاتو خۆزگەی بۆ مەرگو گەڕانەوەی یەکجارەکی بۆ لای خودا دەخواست، بە خاتری ئەمە ڕووی لە قاپی پەروەردگار دەناو لێی دەپاڕایەوە مەرگی بە نسیب بکات، بەگوێرەی ڕیوایەتەکان: ئەو ڕۆژێك لە وتارەکەیدا وتی: خودایە من ئەو خەڵکەم بێزار کردو ئەوانیش منیان بێزار کرد، من ئەوانم وەڕز کردو ئەوانیش منیان وەڕز کرد، خودایە خێرا لەدەست ئەمانەم ڕزگار بکەو بمحەسێنەوە، خێرا ئەوانەم لە دەست ڕزگار بکەو بیانحەسێنەوە، دەستی لەسەر ڕیشی داناو وتی: ئەوە چ شتێك ڕێی لە هەرە بەدبەختەکەتان گرتووە ئەمە بە خوێنم ڕەنگ بکات؟.[2] ئەمەو (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) لە ڕۆژانی کۆتایی ژیانیدا زۆر بە هەڵەداوان لە خودا دەپاڕایەوە، لە (جوندوب)ەوە دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: قەرەباڵغیان لە دەورەی (عەلی) دروست کرد، تا ئەوە بە پێیەکانیان لەسەر جێگاکەیدا هاتوچۆیان دەکرد، جا وتی: خوایە لێم بێتاقەت بوونو لێیان بێتاقەت بووم، ڕقم لێیان دەبێتەوەو ڕقیان لێم دەبێتەوە، ئیتر بۆ خۆتم بەرەوە: بمحەسێنەوەو بیانحەسێنەوە.[3] بەپێی ڕیوایەتێکی تر: لە (ئەبو صالح)ەوە: وتی: ئاگام لێ بوو (عەلی) (موصحەف)ی لەسەر سەری داناو گوێم لە تەقەتەقی پەڕەکانی بووو وتی: خوایە! من داوای حوکمی نێو ئەمەیان لێکردم، بەڵام ڕێیان لێ گرتم، خودایە لێم بێزاربوونو لێیان بێزار بووم، ڕقم لێیان دەبێتەوەو ڕقیان لێم دەبێتەوە، دەیانەوێت لەسەر ڕێو ڕەوشتو خوخدەی خۆم لابدەن، یەکێکی خراپتر لە منیان بۆ بنێرە، ئەوانەم بە خەڵکانێکی تر بۆ بگۆڕە، چۆن خوێ لەناو ئاودا دەتوێتەوەو پەرشو بڵاو دەبێت ئاوا دڵەکانیان

---

١ التاريخ الصغير للبخاري (٤١/١)، خلافة علي (ص: ٤٣١).

٢ مصنف عبدالرزاق (١٥٤/١٠) باسناد صحيح، الطبقات (٤/٣).

٣ الاحاد والمثاني لإبن أبي عاصم (٣٧/١) بإسناد حسن، خلافة علي (ص: ٤٣٢).

بتوێنەوەو پەرش‌و بڵاویان بکەی.[١] لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێت: سێ ڕۆژی پێ نەچوو کوژرا (ڕەحمەتی خوای لێ بێت).[٢]

(حەسەنی کوڕی عەلی) وتی: (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) وتی: ئیمشەو پێغەمبەری خودا (ﷺ)م لە خەودا بینی، گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەزانی تووشی چ خوارو خێچیەك‌و دوژمنایەتی‌و بەربەرەکانێیەك بووم لە لایەن ئومەتەکەتەوە؟ فەرمووی: تۆك‌و نوعایان لێ بکە، وتم: خوایە ئەم خەڵکەم بۆ بگۆڕە بە بە خەڵکێکی باشتر، منیان بۆ بگۆڕە بە یەکێکی خراپتر. (حەسەن) (خودا لێی ڕازی بێت) وتی: جا لە ماڵ هاتە دەرەوەو پیاوەکە لێیدا.[٣]

کاتێك هەواڵی کوژرانی (عەلی) بە (معاویە) گەیشت، (معاویە) دەستی بە گریان کرد، هاوسەرەکەی پێی وت: شەڕیشت لەگەڵی کردوەو بۆشی دەگریەی؟ وتی: بەربەلای، تۆ نازانی خەڵك بە لەدەستدانی عەلی چ شتێکی گەورەیان لە فەزڵ‌و فیقهو زانست لە کیس چووە؟!

هەر جارێك (معاویە) بەلایەك یان پرسێکی سەخت ڕووی تێ بکردبایە، نامەی دەنووسی تا سەبارەت بەمە پرسیار لە (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) (خودا لێی ڕازی بێت) بکەن، جا کاتێك هەواڵی کوژرانی ئەوی پێگەیشت، وتی: فیقهو زانست بە مەرگی (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) لە دەست دەرچوو، (عوتبە)ی برای پێی وت: با خەڵکی شام ئەم قسەیەت لێ نەبیستن، بەرپەرچی دایەوەو وتی وازم لێ بێنە.[٤]

(معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) لە سەردەمی خیلافەتی خۆیدا داوای لە (ضرار الصدائي) کرد وەصفی (عەلی) بۆ بکات، وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران ببوورە، وتی: بە خوا وەصفی دەکەی، وتی: بەلام کە هەر پێویست بێت وەصفی بکەم، ئەوا دەڵێم: سوێند بە خوا دەست ڕۆیشتوو دووربین‌و بارقوڵ بوو، بە زەبروزەنگ‌و بەهێز بوو، قسەی یەکلاکەرەوەو تێرو تەواوو پڕ بەپێست‌و واتاداری دەکردن.[٥] دادپەروەرانە حوکمی دەکرد، زانست لە هەموو لایەکیەوە هەڵدەقوڵی، ئەندامەکانی بە ئامۆژگاری جوان دەهاتنە گفتوگۆ، خۆی لە دونیاو

---

١ سير أعلام النبلاء (١٤٤/٣).
٢ المحن (ص: ٩٩) لأبي العرب، خلافة علي لعبد الحميد (ص: ٤٣٢).
٣ تاريخ الاسلام في عهد الخلفاء الراشدين (ص: ٦٤٩).
٤ البداية والنهاية (١٣٣/٨).
٥ الاستيعاب (١١٠٧/٣).

شتە ڕازاوەکان نەناس دەکرد، هۆگری شەوو تاریکاییەکەی ببوو، دارای پەندی بەرفراوان‌و بیرکردنەوەی دوورو قوڵ بوو، بە بەرگی کورت‌و خواردنی کەم تام سەرسام بوو، لەنێوماندا وەکو کەسێکی سادە بوو، گەر پرسیارمان لێ کردبایە وەڵامی دەداینەوە، ئەگەر داوای هەواڵێکمان لێ کردبایە هەواڵی پێ دەداین، سوێند بێت بە خوا ئەگەرچی لێمانەوە نزیك بوور لێشیەوە نزیك بووین، بەڵام لەبەر سام‌و هەیبەتی زۆری خەریك بوو قسەمان بۆ لەگەڵ نەکرێن، ڕێزو تەقدیری خەڵکی دینداری دەگرت، خۆی لە هەژاران نزیك دەکردەوە، قەت مرۆڤی بەهێز بە تەما نەبوو چاوپۆشی لە ناهەقیەکەی بکات، مرۆڤی لاوازیش لە دادپەروەریەکەی نائومێد نەدەبوو، من شایەدی دەدەم کە لە هەندێك هەڵوێستیدا بینیومە، کاتێك شەوگار تاریك دەبوو، ئەستێرەکان ئاوا دەبوون، بە دەستی ڕیشی خۆی دەگرت، وەکو نەخۆش لەسەر جێگاکەی جینگڵی دەداو هەڵسوڕداسوڕی دەکرد، وەکو کەسێکی غەمبار دەگریاو دەیوت: ئەی دونیا برۆ غەیری من هەڵخەڵەتێنە، ئەوە خۆم پیشان دەدەیت یان خۆم بۆ دەڕازێنیتەوە؟ هەیهوو هەیهوو، سێ بە سێ تەلاقم دای‌و دەستی خۆمم لێ بەردای جارێکی تر ناگەڕێیتەوە لام، ئاخر تەمەنت زۆر کورتەو سامناکیەکەت یەکجار زۆرە، ئاخ! لەبەر کەمی توێشوو و دوور و درێژی ڕێی سەفەرو تەنهایی‌و بێ هاوەڵی ڕێ!

(معاویە) گریاو وتی: ڕەحمەتی خوا لە (ئەبو حەسەن) دەنا وەڵڵاهی ئاوا بوو، ئەندازەی پەرۆش بوونت بۆ ئەو چەندەو چۆنە؟ زورار وتی: پەرۆشبوونی من بۆ ئەو کتومت وێنەی پەرۆشبوونی ئەو دایکەیە کە کوڕەجگەرگۆشەکەی لە باوەشیدا سەردەبڕدرێت.[1]

لە (عومەری کوڕی عبدالعزیز)ەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) وتی: لە خەونمدا پێغەمبەری خودا (ﷺ)م بینی، (أبوبکرو عمر)ی لە لا دانیشتبوون، سەلامم لێکرد، لەو بەینەدا من دانیشتبووم (عەلی‌و معاویە)یان هێناو بردیان‌و دەرگایان لەسەر داخستن، من تەماشام دەکرد، خێرا (عەلی) هاتە دەرەوەو دەیوت: سوێند بە پەروەردگاری کابە هەقەکەیان بە من دا، ئەمجا هێندەی نەخایاند (معاویە)ش هاتە دەرەوەو دەیوت: سوێند بە خودای کابە چاوپۆشی لە گوناهەکانم کرا.[2]

---

١ الاستيعاب (١١٠٨/٣).

٢ البداية والنهاية (١٣٣/٨).

# باسی چوارەم

## ( معاویە ) لە سەردەمی خیلافەتی ( حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تالیب )دا ( خودا لێیان ڕازی بێت ):

مانگی ڕەمەزانی ساڵی (٤٠)ی کۆچی، دوابەدوای شەهیدکرانی (عەلی کوڕی ئەبو تالیب)ی ئەمیری ئیمانداران لەسەر دەستی (عبدالرحمن ی کوڕی مولجەمی موڕادی)ی سەر بە (خەواریج) بەیعەتی خیلافەت درا بە (حەسەنی کوڕی عەلی) (خودا لێیان ڕازی بێت).[1] ئەمەو ئەمیری ئیمانداران کەسی بۆ دوای خۆی دیاری نەکرد، بەڵکو خەڵك لە دوای شەهیدبوونی باوکی هەڵیانبژارد.

لە (عبدالله ی کوڕی سەبوع)ەوە وتی: گوێم لە (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) بوو دەیوت: بە خوا ئەم ڕیشە بە خوێنی ئەم سەرە ڕەنگ دەکەن، ئەو بەدبەختو ماڵ وێرانە چ چاوەڕوانیەکی لە من هەیە![2] وتیان: ئەی ئەمیری ئیمانداران: هەواڵی ئەو کەسەمان پێ بڵێ بە کەس‌و کارەوە لەنێوی دەبەین، وتی: کەواتە لە بەرانبەر کوژرانی مندا کەسانێك دەکوژن کە بکوژی من نەبوون، وتیان: کەسێك دوای خۆت بکە بە (خەلیفە) بەسەرمانەوە، وتی: نا، بەڵام چۆن پێغەمبەری خودا (ﷺ) بەجێی هێشتن منیش ئاوا بەجێتان دێڵم، وتیان: ئەگەر چویتە لای پەروەردگارت چی پێ دەڵێی؟ (وەکیع)[3] جارێك وتی: ئەگەر گەیشتی بە پەروەردگارت چ دەڵێی؟ وتی: دەڵێم: خودایە تا ئەوەندەی ویستت منت لە نێویاندا بەجێ هێشت، پاشان بۆ لای خۆتت بردمەوەو خۆت لەنێویاندا بووی، ئەگەر ویستت لەسەر بێت چاکیان دەکەی، ئەگەر ویستت لەسەر بێت خراپیان دەکەی.[4] بەپێی ڕیوایەتێکی تر وتی: دەڵێم: خودایە ئەوەندەی ویستت لەسەر بوو کردتمە جێنشین لەنێویاندا، ئەمجا بۆ خۆت بردمەوە، منیش تۆم لەنێویاندا بەجێ هێشت.[5]

دوابەدوای کوژرانی (عەلی)، (حەسەنی کوڕی عەلی) نوێژی لەسەر کرد، چوار جار (الله أكبر)ی لەسەر لێدا، لە (کوفە) نێژرا، (قەیسی کوڕی سەعد) یەکەم کەس بوو بەیعەتی بە

---

١ الطبقات (٣/٣٥ـ٣٨)، تحقيق د. إحسان عباس.

٢ مجمع الزوائد (٩/١٣٩)، مسند أحمد (٢/٣٢٥) حسن لغيره.

٣ (وەکیعی کوڕی جەڕڕاح)، ثقة حافظ عابد (التقريب) ص: ٥٨١).

٤ مسند أحمد (٢/٣٢٥)، حسن لغيره (الموسوعة الحديثية).

٥ كشف الأستار عن زوائد البزار (٣/٢٠٤).

(حەسەن) دا، پێی وت: دەستت بێنە بەیعەتت پێ بدەم لەسەر کتێبی خوداو سوننەتی پێغەمبەرەکەی‌و کوشتاری پەیمان شکێنەکان (لە خەواریج‌و ستەمکاران) (حەسەن) (خودا لێی ڕازی بێت) پێی وت: لەسەر کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەی، ئەوە لە دوای هەموو مەرجێکی ترەوە دێت، ئەمجا بەیعەتی پێداو بێ دەنگ بوو، خەڵکیش بەیعەتیان پێدا،[١] کاتێك خەڵکی عێراق خەریك بوو بەیعەتی پێ بدەن، (حەسەن) مەرجی لەسەر دانان‌و وتی: ئێوە دەبێت گوێڕایەڵ‌و ژێرفەرمان بن، ئاشتەوایم لەگەڵ کێدا ئەنجام دا ئاشتەوایی لەگەڵ دەکەن، جەنگم لەگەڵ کێ کرد جەنگی لەگەڵ دەکەن،[٢] لە ڕیوایەتێکی تردا، پێی وتن: وەڵلاهی تەنها بەو مەرجەی پێتان دەڵێم بەیعەتتا لێ وەردەگرم، وتیان: ئەو مەرجە چییە؟ وتی: ئاشتیم لەگەڵ هەر کەسێکدا کرد ئاشتی لەگەڵ دەکەن، جەنگم لەگەڵ هەر کەسێك کرد جەنگی لەگەڵ دەکەن.[٣] لە ڕیوایەتی (إبن سعد)دا هاتووە: (حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تالیب) دوابەدوای وەفاتی (عەلی) بە دوو مەرج بەیعەتی لە خەڵکی عێراق وەرگرت: بەیعەتی لێ وەرگرتن لەسەر ئەمیرایەتی‌و لەسەر ئەوەش خۆی بە هەر شوێنێکدا کردو پێیدا ڕۆیشت بە دوای بکەون‌و بە هەر چ شتێکیش ئەو پێی ڕازی بوو ئەوانیش پێی ڕازی بن.[٤]

بە گوێرەی ئەم ڕیوایەتانەی باسکران، (حەسەنی کوڕی عەلی) لەگەڵ یەکەم ساتەوەختی وەرگرتنی پۆستی خیلافەت ڕێگەی بەردەم صوڵح‌و ئاشتەوایی خۆشکرد، وەکو (خەلیفە) دەستی بە کارەکانی خۆی کرد، کاربەڕێوەبەرەکانی حکومی‌و فەرماندە سەربازییەکانی سوپای ڕێکوپێك کردن‌و خەڵکی چەکدار کردو پارەی بەسەردا دابەشکردن‌و موچەی سەربازانی لە سەدا سەد زیاد کرد، بەمە ڕەزامەندی هەمووانی بۆ خۆی مسۆگەر کرد.[٥]

ئەو دەیتوانی جەنگێکی بێ ئەمان لە دژی (معاویە) بەرپا بکات، لە هەموو بوارەکانی (سەربازی‌و ئەخلاقی‌و سیاسی‌و دینداری)یەوە خاوەن کەسایەتیەکی هێندە بەرزو سەرکەوتووو دەگمەن بوو، کە بە هۆیەوەو بە هۆی چەندین کاریگەری ترەوە دەیتوانی ئەمە بکات، بوونی چەندین کەسایەتی سەرکەوتووی وەکو (قەیسی کوڕی‌سەعدی ساعیدەو عەدی کوڕی حاتەمی تەی‌و هی تریش) لەنێو حکومەتەکەی حەسەندا کە لە بوارەکانی

---

١ تاریخ الطبري (٧٧/٦).
٢ تاریخ الطبري (٧٧/٦).
٣ الطبقات، تحقيق: د. محمد السلمي (٢٨٦/١، ٢٨٧).
٤ المصدر نفسه (٣١٦/١، ٣١٧).
٥ تاريخ العراق في ظل الحكم الأموي (ص: ٦٧)، مقاتل الطالبيين (ص: ٥٥).

ەڕێوەبردنو سەکردایەتیکردنی سوپادا دەستێکی بالآیان هەبوو، هێندەی تر گەرمو گوڕیان بە هێزە چەکدارەکان دەدا، بەلآم لەگەلّ هەموو ئەمانەدا (حەسەنی کوڕی عەلی) لە پێناوی ومستانی خوێنو یەکگرتوویی ئوممەتو حەزکردن بەو شتە گرانبەهایانەی لەدەست خودادانو خۆبواردن لە دەسەلآتو سامانی دونیاو چەندین شتی تریش لای بە لای صولحو ئاشتەواییدا کردەوەو سەرکردایەتی ئەو پرۆسە ئاشتیخوازیەی کرد کە ئوممەتی گەیاندەوە وتکەی یەکبوون، چەندین بەلّگەی بەهێز ئاماژە بەوە دەدەن کە (حەسەنی کوڕی عەلی خودا لێیان ڕازی بێت) لە وێستگای هێزو دەسەلآتەوە ئاشتەوایی ئەنجام داو لە پۆستی خیلافەت) هاتە خوارەوە، لەو بەلّگانە:

١ـ ئەو شەرعییەتەی (حەسەن) هەیبوو:

(حەسەنی کوڕی عەلی) دوابەدوای (کۆچی) باوکی بە شێوازی ڕاوێژ هەلّبـژێردراو بوو بە خەلیفەی شەرعی) بەسەر حیجازو یەمەنو عێراقو هەموو ئەو هەرێمانەی لە ژێر دەسەلآتی ـوکیدا بوون، خیلافەتەکەی شەش مانگی تەواو درێژەی کێشا، بە بەلّگەی هەوالّدانەکەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەو ماوەی خیلافەتی ئەویش دەکەوێتە نێو بازنەی خیلافەتی ڕاشیدە کە ماوەی سی سالّ پڕ دەکاتو دوای ئەوەش سیستەمی پاشایەتی دەست پێدەکات، (الترمذي) بە سەنەدی خۆی لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) ڕیوایەتی دەکات کە فەرموویەتی: ((الخلافة في أمتي ثلاثون سنة، ثم ملك بعد ذلك))[1] واتە: خیلافەت ماوەی سی سالّ لەنێو ئوممەتی مندا بەرقەرار دەبێتو پاشان مەلیکایەتی دێت.

(إبن كثير) قسە لەسەر ئەم فەرموودەیە دەکاتو دەلّێت: سیستەمی خیلافەت بە ماوەی خیلافەتەکەی (حەسەنی کوڕی عەلی)یەوە سی سالّەکەی پڕ کرد، ئەو لە مانگی ڕەبیعی یەکەمی سالّی چلو یەك (٤١)ی کۆچی پۆستی خیلافەتی بۆ (معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان) چۆلکرد، لەو ڕۆژەدا سی سالّی تەواو بەبێ کەمو زیاد لەسەر وەفاتی پێغەمبەری خودادا (ﷺ) گوزەری کرد، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) لە مانگی ڕەبیعی یەکەمی سالّی یانزە (١١)ی کۆچیدا وەفاتی کرد، ئەمە یەکێکە لە بەلّگەکانی پێغەمبەرایەتی (محمد المصطفى) (ﷺ).[2]

---

١ سنن الترمذي مع شرحها تحفة الأحوذي (٦/٣٩٥ـ٣٩٧) حديث حسن.

٢ البداية والنهاية (١١/١٣٤).

بەم شێوەیە (حەسەنی کوڕی عەلی) دەبێتە پێنجەم خەلیفە لە خەلیفە سەرڕاستەکان،[١] زۆرێك لە زانایانی ئەهلی (سوننەتو جەماعەت) قسەیان لەسەر شەرعیبوونی خیلافەتی (حەسەنی کوڕی عەلی) کردووە، لە نێوانیاندا: (أبو بکر بن العربي،[٢] قاضي عیاض،[٣] إبن کثیر،[٤] شەرحکەری الطحاویة،[٥] المناوي،[٦] ابن الحجر الهیثمي[٧]).. بە نموونە دێنە بەرچاو، ئەگەر (حەسەن) بیویستبایە بە حوکمی شەرعیبوونی خۆی خۆی بە ململانێی (معاویە)وە خەریك بکات، بێگومان کە دەیتوانیو ئەمەی بۆ دەکراو هێرشێکی ڕێکوپێکی ڕاگەیاندنو بانگەشەی بە نێوەندەکانی شامدا بڵاودەکردەوەو متمانەی خۆی پێ دەبەخشینوسەرنجی بە لای خۆیدا ڕادەکێشان، یان بە لانی کەمەوە هەڵوێستی (معاویە)ی لە نێوانیاندا بە لەقەلەق دەخست، ئەو بە خاتری ئەوە نەوەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) بوو و پاڵی بەو شەرعییەتەوە دابوو کە گاڵتەی پێ نەدەکرا، ببوو بە خاوەنی هێزێکی گەورە و دەسەڵاتێکی بەرفراوانی مەعنەوی.

**٢ـــ (حەسەنی کوڕی عەلی)و هەڵسەنگانی هەڵوێستو توانا سەربازیو سەرکردەییەکانی خۆی:**

کاتێك (نفیری کوڕی حضرمی) پێی وت: خەڵك پێیان وایە تۆ (خیلافەت)ت گەرەکە؟ وتی: جڵەوی سەردارانی عەرەب بە دەست منەوەیە، ئاشتی لەگەڵ کێ بکەم ئاشتی لەگەڵ دەکەن، جەنگ لەگەڵ کێ بکەم جەنگی لەگەڵ دەکەن، منیش بۆ بەدەستخستنی ڕەزامەندی خودا وازم لێ هێنا.[٨]

ئەمە شایەتی دانێکە لە لایەن خودی حەسەنەوە (خودا لێی ڕازی بێت): کە ئەو لە سەنگەرێکی قایمو بارودۆخێکی بەهێزدا بووەو، شوێنکەوتووەکانیشی سازو ئامادەبوون تا بە خواستو ویستی ئەو شەڕ یان ئاشتی لەگەڵ ئەو کەسو لایەنانەدا بکەن کە ئەو بۆیان

١ مآثر الإناقة (١٥٠/١)، مرویات خلافة (معاویة) (ص: ١٥٥).
٢ أحکام القران لإبن العربي (١٧٢٠/٤).
٣ شرح النووي علی صحیح المسلم (٢٠١/١٢).
٤ البدایة والنهایة (١٣٤/١١).
٥ شرح الطحاویة (ص: ٥٤٥).
٦ فیض القدیر (٤٠٩/٢).
٧ الصواعق المحرقة (٣٩٧/٢).
٨ البدایة والنهایة (٢٦٠/١١).

یاری دەکات، ئەو (خودا لێی ڕازی بێت) لە وتاردان‌و ڕەوانبێژی‌و سەرنج ڕاکێشان‌و خرۆشاندنی جەماوەردا دەستێکی باڵای هەبوو، نزیکبوونی لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) وای لێکردبوو زۆر بەهێزو تۆکمەو دامەزراو بێت، بەڵگەمان لەسەر ئەمە ئەوەیە: کە توانی دانیشتوانی کوفە وادار بکات‌و لەگەڵ باوکی بچنە دەرەوە، پێشدا (ئەبو موسای ئەشعەری) خودا لێی ڕازی بێت) خەڵکی سارد دەکردەوەو نەیدەهێشت بۆ جەنگ دەربچن‌و بەشداری شەڕی براکوژی بکەن، ئەو فەرموودانەی بە گوێ دادەدان کە لە پێغەمبەری خودا (ﷺ)ەوە گوێی لێ ببوون‌و دەیترساندن‌و لە بەرانبەر بەشداریکردنی شەڕو فیتنەو ئاژاوە دەیسڵەماندنەوە،[1] عەلی (خودا لێی ڕازی بێت) لە پێش (حەسەن)دا (محمدی کوڕی ئەبو بەکرو محمدی کوڕی جەعفەر)ی بۆ ئەم مەبەستە ناردبوون، بەڵام سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا، دوای ئەوانیش (هوشامی کوڕی عقبەی کوڕی ئەبی وەقاص)ی ناردبوو، بەڵام بە هۆی کاریگەری (ئەبو موسا) لەسەریان ملیان نەدا.[2] ئەمجا بە دوای ئەودا (عبدالله ی کوڕی عەباس)ی نارد، هەر بە قسەیان نەکرد، دوای ئەویش (عەمماری کوڕی یاسرو حەسەن)ی ناردن،[3] (حەسەن) کاری تێکردن، لەنێو ئاپۆڕای خەڵکدا هەستایە سەرپێ‌و، وتاری بۆ دان‌و وتی: ئەی خەڵکینە: وەڵامی بانگەوازی ئەمیرەکەتان بدەنەوە، هەستن بەرەو لای برایەکانتان بەڕێکەون، لەمەودوا کەسانێك بۆ ئەم کارە پەیدا دەبن کە بۆ خۆیان پەلەی بۆ دەکەن، بەڵام بە خودا ئەگەر خەڵکانی خاوەن ئاوەز سەرپەرشتی بکەن ئەوا هەم بۆ دونیا جوانترە، هەم بۆ دواڕۆژیش خێرترە،[4] بە دەم بانگەکەمانەوە وەرن لە بەرانبەر ئەو بەڵایەی تووشی ئێمەو ئێوە بووە، یارمەتیمان بدەن‌و پشتمان بگرن.[5] ئیدی خەڵکێکی زۆری شاری کوفە دەستیان لەسەر سنگیان داناو وتیان لە خزمەتت داین‌و ژمارەی شەش تا حەوت هەزار کەس لەگەڵ (عەممارو حەسەن) کەوتن‌و بەرەو صفین دەرچوون،[6] با ئەوەش لە یاد نەکەین

---

١ تاريخ الطبري (٥/٥١٤)، مصنف إبن أبي شيبة (١٥/١٢)، إسناده حسن.
٢ خلافة علي بن أبي طالب (ص: ١٤٤)، لعبدالحميد، سير أعلام النبلاء (٣/٤٨٦).
٣ فتح الباري (١٣/٥٣)، علي بن أبي طالب للصلابي (٢/٦٠).
٤ تاريخ الطبري (٥/٥١٦).
٥ تاريخ الطبري (٥/٥١٦).
٦ منصف عبدالرزاق (٥/٤٥٦، ٤٥٧)، بسند صحيح للزحيلي.

کە ئەو کاتە (ئەبو موسای ئەشعەری) والی (کوفە) بوو، لە سەردەمی (عمر)ەوە لەوێ نیشتەجێ ببوو، یەکێك بوو لە سەرکردە هەرە خۆشەویستەکان بە لای خەڵکی (کوفە)وەو لە ڕووی زانست‌و دنیانەویستیی‌و پێگەی کۆمەڵایەتییەوە گەیشتبووە لوتکە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا (حەسەن) توانی خەڵك لە ژێر کاریگەری ئەو دەربێنێت‌و بەرەو نێوڕیزەکانی سوپای باوکی پەلکێشیان بکات.

٣ـ هەبوونی چەند سەرکردەیەکی گەورەو پلەدار لەنێو ڕیزی سوپاکەیدا: سەربازگەی (حەسەنی کوڕی عەلی) چەندین سەرکردەی گەورەی تێدا بەدی دەکران، وەکو: (حوسەین)ی برای، (عبدالله ی کوڕی جەعفەر)ی ئامۆزای، (قەسیی کوڕی سەعدی عوبادە) -کە لە ڕیزی پیاوە زرنگو بیرتیژەکان دێتە هەژمار-، (عەدی کوڕی حاتەمی تەی)و، چەندین کەسایەتی تریش، خۆ ئەگەر (خیلافەت)ی بویستبایە، ئەوا ڕێی بە سەرکردەکانی دەدا خەڵك پڕ چەك بکەن‌و جەنگ لەگەڵ (معاویە)دا بکەن، یان بە لانی کەمەوە دەیتوانی تا ماوەیەکی باش بەسەر وڵاتانی ژێر قەڵەمڕەوی حوکومەتەکەی خۆیدا لە پۆستی (خیلافەت)دا بمێنێتەوە.

٤ـ شارەزابوونی تەواوی بەسەر دڵ‌و دەروونی خەڵکی عێراق:

(حەسەنی کوڕی عەلی) لە بواری ناسینی دانیشتوانی عێراق‌و شارەزابوون بە ناخیان‌و چۆنیەتی هەڵسوکەوت لەگەڵ کردنیاندا دارای توانایەکی تایبەت بوو، لەبەر ئەمە هەر لە سەرەتای خیلافەتەکەیدا موچەی بۆ زیاد کردن‌و حاڵ‌و گوزەرانی بەرەو پێش بردن، دەبێ ئەوەش بزانین کە ئەرکی سەرکردایەتیکردنی پرۆسە چاکسازی‌و ئاشتیخوازیەکەی زۆر لەوە گرانتر بوو کە بچێ شەڕ لەگەڵ (معاویە)دا بکات، بەڵام بەسەر زۆرێك لەو ئاستەنگانەدا زاڵ بوو کە لەم ڕێیەدا ڕووبەڕووی بوونەوە، لەو ئاستەنگانە: هەوڵیان دا بیکوژن، هەندێك خەڵك صوڵحیان ڕەتکردەوەو چەند ئاستەنگێکی تریش بەربینگیان پێ گرت، بەڵام ئەو (بە ئیزنی خودا) بەسەر هەموو ئەو لەمپەرانەدا زاڵ بووو توانی هەموو ئەو ئامانجانە بپێکێت کە نەخشەی بۆ کێشابوون لە: وەستاندنی خوێن، یەکێتی ئوممەت، ئاسایشی ڕێگاوبانەکان، گێڕانەوەی بزووتنەوەی فتوحات... هتد، کە هەر هەموو ئەمانە دەبنە بەڵگە لەسەر دارای تواناو دەسەڵاتێکی دەگمەن لە بواری سەرکردایەتیکردن‌و کاربەڕێوبەریدا.

٥ـ نرخ دانان‌و حیساب بۆ کردن بۆ هێزەکانی (حەسەنی کوڕی عەلی) لە لایەن (معاویە)و (عەمروی کوڕی عاص)ەوە: لە (صەحیحی بوخاری)دا هاتووە: سوێند بە خودا (حەسەنی کوڕی عەلی) بە چەند کەتیبەیەکی سەربازی چەشنی چیای سەرکەش بەرەو لای (معاویە)

بەرێکەوت، (عەمروی کوڕی عاص) وتی: من چەند کەتيبەيەکی وا گەورە دەبينم تا هەر هەموويان نەکوژی پشت لە شەڕ ناکەنو هەڵ نايەن، (معاويە) –کە بە خوا لە (عەمرو) باشتر بوو– وتی: ئەگەر ئەمانە ئەوانەيان کوشتو ئەوانە ئەمانەيان کوشتن، کێم بە دەستەوە دەمێنێت کاروباری خەڵك بەڕێوەبەرێت، کێ سەرپەرشتی ژنەکانيانو ماڵو منداڵەکانيانو کارو کەسابەتەکانيان بکات؟

ئەمجا (عبدالرحمن ی کوڕی سەمورە)و (عبدالرحمن ی کوڕی عامری کوڕی کورەيزە)ی قورەيشی سەر بە تيرەی (بەنوعبدشمس)ی بۆ لای (حەسەن) بەڕێکردنو پێی وتن: بڕۆن بۆ لای ئەو پياوەو هەموو شتێکی بخەنە بەرچاوو هەموو بەڵێنێکی پێ بدەنو سەبارەت بە صوڵحو پێکهاتن قسەی لەگەڵ بکەنو داوای لێبکەن ئاشتی بکات.[1]

أـ (عەمروی کوڕی عاص) (خودا لێی ڕازی بێت)ی سەرکردەی سەربازی بەناوبانگو سياسەتمەداری ئەزموندیدەو خاراوی نێوجەنگو کوشتار دەڵێت: من ژمارەيەك کەتيبەی سەربازی وام دێنە بەرچاو بە کوشتن نەبێ ناکشێنەوە دواوە.

ب ـ بەڵام (معاويە) هەڵوێستە سەربازيەکە هەڵدەسەنگێنێتو پێی وايە کە: هيچ کامێك لەم دوو سەربازگەيە ناتوانێت بە شێوەيەکی يەکلاکەرەوە سەرکەوتن بەسەر بەرانبەرەکەيدا تۆمار بکات، مەگەر دوای خستنەوەی زيانێکی گەورەی گيانی لە هەردوولا ، هەتا خودی (معاويە) ئەگەر سەرکەوتنيش بەدەست بێنێت، ناتوانێت خۆی بخاتە ژێر باری ئەو پەرێزوشوێنەوارانەی جەنگەکە لە دوای خۆيەوە بەجێيان دێڵێت لە: کەوتنەوەی بێوەژنو هەتيوگەلێکی زۆری کوژرانی موسڵمانە هەرە چاکو هەڵبژاردەکانی نێو ئوممەت، سەرهەڵدانی دەيان گەندەڵی گەورەی وەك گەندەڵی سياسی، کۆمەڵايەتیو ئابووریو ڕەوشتی، لەبەر ئەمە (معاويە) دوو کەسايەتی مەزنو خاوەن پێگەی کۆمەڵايەتی لە هاوەڵانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) کە قورەيشی بوونو بە لای (حەسەن)يشەوە جێگای خۆشەويستیو ڕێزو تەقدير بوون هەڵبژاردنو بۆ لای (حەسەن)ی ناردن، بێگومان هەڵبژاردنی ئەم دوو کەسايەتيە لە لايەن (معاويە)وە (خودا لێی ڕازی بێت) دەری دەخات کە ئەو زۆری مەبەست بووە بە هەر جۆرێك بێ ئاشتی لەگەڵ (حەسەن) ئەنجام بدات، ئيدی سەرەداوی دواهەڵوێست کەوتە

---

١ البخاري، كتاب الصلح (رقم: ٢٧٠٤).

بەردەستی (حەسەن)و پشتیوانەكانی، خۆ ئەگەر (حەسەن)و بەرەكەی جێگای مەترسی نەبوونایە، ئەوا (معاویە) پێویستی بەوە نەبوو سازشی لەگەڵ بكاتو مەرجو داواو دابینكاریەكانی لێ قبوڵ بكات، ئەگەر بەبەرچاوی خۆیەوە لاوازی بەرەی (حەسەن)و لێكهەڵوەشان لە ڕیزی سوپاكەیدا بەدی كردبایە، ئەوا بەبێ ئەنجامدانی سازشو قبوڵكردنی مەرجو داواكاریەكان خۆیو سوپاكەی خۆیان بە (كوفە)دا دەكرد.[١]

(حەسەنی كوڕی عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) زاتێكی پاكی ئاشتیخواز بوو، دارای بیروبۆچوونێكی ڕوونو بەرزی چاكساریو ئاشتیخواری وابوو كە بە چەند قۆناغی سەختو دژوارو پڕ كەندو كۆسپدا تێپەڕی، بەڵام دەرەنجام بەسەر تەواوی كۆسپەكانی سەرڕێدا زاڵبوو، مەرجەكانی خۆی نوسینەوەو صوڵحێكی وای ئەنجام دا كە دەیان بەرهەمو ئامانجی گەورەی لێكەوتنەوە، بۆیە تا دونیا دونیایە ئەم (صوڵحە) بە یەكێك لەو كارە هەرە مەزنانە دادەنرێت كە (حەسەن)یان پێ هەڵدەكێشرێ و مەتح دەكرێ، چۆن كۆكردنەوەی قورئان بە سونبولی كردارە مەزنەكانی (عوسمان)و (جەنگی هەڵگەڕاوەكان) بە سونبولی كردارە مەزنەكانی (ئەبوبەكر) دادەنرێن، ئەوا (صوڵحەكەی گەڵ معاویە)ش بە سونبولی كردارە مەزنەكانی (حەسەنی كوڕی عەلی) دادەنرێت.[٢]

سەرەڕای هەموو ئەمانەش ئەم كردارەی (حەسەن) بە یەكێك لە نیشانەكانی پێغەمبەرایەتی دادەنرێت، بەڵگە لەسەر ئەمە، ئەو فەرموودەیەیە كە (بوخاری) لە ڕێی (ئەبوبەكرە) (خودا لێی ڕازی بێت)ەوە هێناویەتیو دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ)م بەسەر مینبەرەكەیەوە بینی، (حەسەنی كوڕی عەلی) لە تەنیشت بوو، جارێك ڕووی لە خەڵك دەكردو جارێك ڕووی لە ئەو دەكردو دەیفەرموو: ((إن إبني هذا سيد، ولعل الله أن يصلح به بين فئتين عظيمتين من المسلمين)).[٣] واتە: ئەم كوڕەی من سەیدو سەروەرە، تكام وایە لە خودا صوڵحی نێوان دوو كۆمەڵی گەورەی موسڵمانی پێ ئەنجام بدات.

---

١ دراسة في تاريخ خلفاء الدولة الأموية (ص: ٦١).

٢ مرويات خلافة (معاوية) في تاريخ الطبري (ص: ١٣٤).

٣ البخاري (رقم: ٧١٠٩).

## یەکەم: گرنگترین قۆناغەکانی صوڵحەکە:

ئەم صوڵحە بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕی، گرنگترینی ئەم قۆناغانە:

**قۆناغی یەکەم:**

پاڕانەوەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە خودا بۆ (حەسەن) تا صوڵحی نێوان دوو کۆمەڵی گەورەی موسڵمانی پێ بکات، ئەم دوعا بە فەڕو پیرۆزە (حەسەن)ی گەیاندە ئەو ئاستەی بەوپەڕی بڕوا بەخۆبوون بڕیاری تەواوەوە هەنگاو بەرەو صوڵحو ئاشتەوایی هەڵێنێت.[1]

**قۆناغی دووەم:**

مەرجی بەیعەت وەرگرتنەکەی (حەسەن) لە خەڵکی عێراق ئەمە بوو: دەبێت ئاشتەوایی لەگەڵ ئەو کەسە بکەن کە ئەو ئاشتەوایی لەگەڵ دەکاتو جەنگ لەگەڵ ئەو کەسەش بکەن کە ئەو جەنگی لەگەڵ دەکات.[2]

**قۆناغی سێیەم:**

یەکەمین هەوڵی ناحەزان بۆ ڕەشەکوژکردنی (حەسەن) پاش دەرکەوتنی نیەتو نیازی ئەو بۆ ئاشتی کردن لەگەڵ (معاویە)، ئەم ڕووداوە بە کەمێك دوای وەرگرتنی پۆستی (خیلافەت) ڕوویدا.[3]

**قۆناغی چوارەم:**

دەرچوونی (حەسەن) بە خۆیو بە سوپای (عێراق) لە (کوفە)وە بەرەو (مەدائن)و بەڕێکردنی هێزی گورزوەشێن (القوة الضاربة) بە ناوی (الخمیس) بەرەو (المسکن) بە سەرکردایەتی (قەیسی کوڕی سەعدی عوبادە).[4]

**قۆناغی پێنجەم:**

دەرچوونی (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) لە (شام)و بەڕێکەوتنی بەرەو عێراق پاش گەیشتنی هەواڵی دەرچوونی (حەسەن) بەخۆیو سوپاکەیەوە لە (کوفە) بەرەو (مەدائین).

---

١ مرويات خلافة (معاوية) في تاريخ الطبري (ص: ٣١٧).

٢ مرويات خلافة (معاوية) في تاريخ الطبري (ص: ١٥٦).

٣ المصدر نفسه (ص: ١٢٦).

٤ المصدر نفسه (ص: ١٢٨).

**قۆناغی شەشەم:**

هاموشۆی نوێنەران لە نێوان (حەسەن‌و معاویە) (خودا لێیان ڕازی بێت)و بە ئەنجامگەیشتنی (صوڵح) لە نێوانیاندا.

**قۆناغی حەوتەم:**

هەوڵدانێکی تر بۆ ڕەشەکوژکردنی (حەسەن) (خودا لێی ڕازی بێت)دوابەدوای سەرکەوتنی گفتوگۆکانی ئاشتی نێوان (حەسەن‌و معاویە) (خودا لێیان ڕازی بێت)، (حەسەن) بە مەبەستی قبوڵکردنی صوڵحی ئەنجامدراو دەستی بە سازکردنی زەمینەی دڵ‌و دەروونی شوێنکەوتووانی کردو بە خاتری ڕوونکردنەوەی ئەوەی لەنێوان ئەوو معاویەدا ڕێککەوتنی لەسەر کراوە هەستایە سەرپاو دەستی بە وتاردان کرد، لە کاتی ئەداکردنی وتارەکەیدا هەندێك لە پیاوانی نێو سەربازگەکەی خۆی بە ئامانجی کوشتنی هێرشیان بۆ برد، بەڵام چۆن خودا لە کوشتنەکەی پێشدا ڕزگاری کردبوو ئەمجارەش دەربازی کرد.[1]

**قۆناغی هەشتەم:**

دابەزینی (حەسەنی کوڕی عەلی) لە پۆستی (خیلافەت)و ڕادەستکردنی کاروباری دەوڵەتداری بە (معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان) (خودا لە هەموویان ڕازی بێت)، ئیتر دوای ئەوە خودا لەو پیلانەی ڕزگار کرد کە لە نێو سەربازگەکەیدا بۆی دانرابوو ، (حەسەنی کوڕی عەلی) (مەدائین)ی بەجێ هێشت‌و بەرەو (کوفە) گەڕایەوەو بەم شێوەیە وتارێکی ئاراستەی خەڵکی (کوفە) کردو وتی[2]: پاش حەمدو سەنا: ئاقڵترین ئەقڵ تەقواو لەخواترسانە، نەفامترین نەفامی تاوانکاری‌و دەستلەخودا بەردانە، ئەو شتەی منو (معاویە) لەسەری ناکۆك بووین، ئەگەرمافی خۆشم بووبێت ئەوا بە مەبەستی چاکسازی نێو ئوممەت‌و وەستاندنی خوێنی ڕۆڵەکانی وازم لە مافی خۆم هێناو دامە (معاویە)، یان ئەگەر مافی مرۆڤێکی تری وا بووبێت کە شایانتر بێت لە من، ئەوا ئەو کارەم ئەنجام دا: ﴿وَإِنْ أَدْرِي لَعَلَّهُ فِتْنَةٌ لَكُمْ وَمَتَاعٌ إِلَى حِينٍ﴾[3]، [4].

---

١ المصدر نفسه (ص: ١٣٩).

٢ مرويات خلافة (معاوية) في تاريخ الطبري (ص: ١٢٦ـ١٤٩).

٣ الانبياء (١١١).

٤ المعجم الكبير (٣/٢٦) إسناده حسن.

## دووەم: گرنگترین هۆکارەکانی صوڵحەکەك

گرنگترین هۆکار کە لە پشت ئەنجامدانی صوڵحەکەی نێوان (حەسەن)و (معاویە)وە بوون، ئەمانە بوون:

١ـ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوداو یەکخستنەوەی ئۆممەت:

کاتێك (نەفیری حەزرەمی) بە (حەسەن)ی وت: جەنابت -بە بڕوای خەڵك- خوازیاری پۆستی (خیلافەت)ی (واتە دوای مردنی معاویە) ، (حەسەن) وەڵامی دایەوەو وتی: جڵەوی سەرانی عەرەب بە دەست خۆمەوەیە، ئاشتی لەگەڵ کێ بکەم ئاشتی لەگەڵ دەکەن، جەنگ لەگەڵ کێ بکەم جەنگی لەگەڵ دەکەن، بەڵام من لەبەر خاتری خوداو بەدەستخستنی ڕەزامەندی ئەو زاتە(بەبێ مەرجوخواستی لەم چەشنە) وازم لە (خیلافەت) هێناوە.[1]

٢ـ نزاکەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ حەسەن:

نزاکەی بۆ حەسەن تا خودا صوڵح‌و ئاشتی لە نێوان دوو کۆمەڵی گەورەی موسڵماندا پێ بکات،[2] هانی (حەسەن)ی دا هەوڵ‌و تەقەلاکانی خۆی لە پێناوی بە ئامانجگرتنی صوڵح‌و زاڵبوون بەسەر ئاستەنگەکانی سەرڕێی ئاشتیدا بخاتەگەڕو لە پێناوی ئەمەدا زەمینەسازی بۆ قایلکردنی دڵ‌و دەروونی خۆی‌و پشتیوانەکانی بکات‌و نەخشەیەکی ڕێکوپێك دابڕێژێت، لە ڕاستیدا ئەم (وشەیە) (حەسەن)ی ئاراستە دەکردوبە تەواوی کاری کردبووە سەر هەڵسوکەوتەکانی‌و پەیڕەوی ژیانی‌و ڕەگ‌و ڕیشەی لە دڵ‌و دەروونیدا داکوتابوون‌و دەستی بەسەر هەست‌و نەستیدا گرتبوو و ئاوێتەی گۆشت‌و خوێنی ببوو، لەسەر بنەمای تێگەیشتنی تەواوی لە نزاکەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئەو، باڵەخانەی پرۆسە ئاشتیخوازیەکەی بەرزکردەوەو بەوپەڕی دڵنیاییەوە دەیزانی ئەنجامەکانی دێنە دی، بۆیە قۆناغەکانی بۆ دابەشکردن، بێگومان فەرموودەکەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) گەورەترین کاریگەری خۆی لەسەر (حەسەن) داناو وەکو هۆکارێکی سەرەکی‌و پاڵنەرێکی بنەڕەتی هانیدا هەنگاو بەرەو ئاشتەوایی‌و چاکسازی هەڵێنێ.

٣ـ بەرگرتن بە ڕژانی خوێنی موسڵمانان:

(حەسەن) (خودا لێی ڕازی بێت) وتی: .... لەوە ترسام ڕۆژی قیامەت زیاتر لە (٧٠) هەزار کەس یان کەمتر لەوە بێن‌و خوێن لە ڕەگی ملیان فوارە بکات‌و هەر هەموویان داوا لە

---

١ البداية والنهاية (٢٠٦/١١).

٢ البخاري رقم (٧١٠٩).

خودا بکەن بۆچی خوێنیان ڕژێنراوە؟[١] هەروەها وتی: ئاگادار بن: ئەگەرچی خەڵکیش پێیان ناخۆش بێت ئەوا بڕیارو فەرمانی خودا ڕوودەدات‌و هیچ شتێك ناتوانێت ڕێی پێ بگرێت، من حەز ناکەم ببمە خاوەنی تۆزقاڵە شتێکی ئوممەتی محمدو دڵۆپە خوێنێکی لەسەر ڕژێنرابێت، چاکم زانیوەو دەزانم چ شتێك سوودم پێ دەبەخشێت و چ شتێکیش زیانم پێ دەگەیەنێت، پەیوەندی بەماڵ‌و پەناو پەسیوەکانی خۆتان بکەنەوە.[٢]

٤ـ پێداگیری لەسەر یەکێتی ئوممەتك

(حەسەنی کوڕی عەلی) (خودا لە خۆی‌و باوکی ڕازی بێت) لە کاتی تێپەڕاندنی یەکێك لە قۆناغەکانی صوڵحەکەدا، هەستایە سەرپاو وتارێکی داو وتی: ئەی خەڵکینە: من بەیانیم کردەوەو تۆزقاڵێك ڕق‌و قینەم لە بەرانبەر هیچ موسڵمانێکدا نەماوە، من چۆن لە بەرژەوەندی خۆم دەڕوانم، ئاواش بیر لە بەرژەوەندیەکانی ئێوە دەکەمەوە، من ڕاوبۆچوونێکم هەیە و دەری دەبڕم تکایە بەسەرمیدامەدەنەوە، بێگومان شتێك کە لەنێو یەکێتیدا لێی بێزار دەبن زۆر باشترە لەو شتەی لەنێو پەرتەوازەییدا پێی خۆشحاڵ دەبن.[٣]

ئەمەو بە فەزڵی خوداو ئەمجا پێداگیری (حەسەن) لەسەر یەکێتی ئۆممەت ئەم ئامانجە گەورە هاتەدی، حەسەن (خودا لێی ڕازی بێت) بە ڕاوبۆچوونی سەرڕاستانەی خۆی‌و بە خاتری (بەرگرتن بە ڕژانی خوێنی موسڵمانان‌و خۆدوورگرتن لەو زەرەرو زیانە گەورانەی وەك بەردەوامبوونی ئاشوب، خوێنڕێژی، پساندنی سیلەی ڕەحم، هاڵۆزی‌و مەترسی ڕێگەوبان، پەکخرانی بزووتنەوەی فتوحات‌و چەندین زیانی تریش) کە بە هۆی ناکۆکی‌و پەرتەوازەییەوە دەکەونەوە لە لوتکەی بەرزی دەسەڵاتی خۆی هاتەخوارو پۆستی (خیلافەت)ی چۆڵکرد، ئیدی سوپاس بۆ خودا بە وازهێنان‌و چاوپۆشیکردنی (حەسەن) لە بەشێکی دنیای خۆی یەکێتی‌و یەکپارچەیی بۆ ئۆممەتی ئیسلام هاتەدی تا ئەوەی ئەو ساڵە ناوی ساڵی یەکێتی (عام الجماعة )ی لێنرا.[٤] ئەمە نیشانەیە بۆ فیقهی (حەسەن) کە لە بواری حیسابکردن بۆ پاشەڕۆژی کارەکان‌و چاودێریکردنی هەڵسوکەوتەکاندا شارەزاییەکی باشی هەبووە.

١ البداية والنهاية (١١/٢٠٦).

٢ تاريخ دمشق (١٤/٨٩).

٣ الأخبار الطوال (ص: ٢٠٠).

٤ إعتبراتات المآلات ومراعاة نتائج التصرفات (ص: ١٦٧).

**٥ـ کوژرانی (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران (خودا لێی ڕازی بێت):**

یەکێکی تر لەو هۆکارانەی (حەسەنی کوڕی عەلی)ی ئەمیری ئیماندارانی بەرەو ئەنجامدانی (صولْح) پەلکێش کرد کوژرانی باوکی بوو، کە بێگومان ئەمە جگە لەوەی کەلێنێکی گەورەی لە بەرەی عێراقدا دروست کرد کاریگەری گەورەشی لەسەر دڵو دەروونی (حەسەن) داناو بە خەفەتباریو دڵتەنگیەوە خستیە نێو گێژەڵاوی ڕووداوەکانەوە، ئەم پێشەوا مەزنە بە ناهەق کوژرا، (خەواریج) هیچ حیسابێکیان بۆ سابیقەو کردارە مەزنەکانیو هەموو ئەو خزمەتە بەرفراوانانە نەکرد کە پێشکەش بە ئیسلامی کردبوون، ژیانی ئەو پڕە بە ڕەوشتو نموونەی بەرزو کارکردن بۆ چەسپاندنی حوکمەکانی شەریعەت لەسەر ئاستی گەلو دەوڵەت، لە ڕاستیدا (عەلی) نیشانەیەك بوو لە نیشانەکانی ئیسلامو ڕێنومایەك بوو هەقو ناهەقی لێك جودا دەکردەوە، لەبەر ئەمە شتێکی سروشتی بوو، کە لە دەستدانی کەسایەتیەکی ئاوا کاریگەری گەورە لەسەر موسڵمانان دابنێتو هەست بەو بۆشاییە گەورە بکەن کە لەنێویاندا دروست بووە، کارەساتی کوژرانی ئەو لەسەر دڵو هەناوی ئەوان گران بوو، هەتا بڵێی بۆی دڵتەنگ بوون، چاوەکانیان بارانی فرمێسکیان بۆ ڕشت، زمانەکانیان بە ستایشکردنیو پێهەڵگوتنیو داواکردنی ڕەحمەت بۆی کەوتنە گۆ، ئیدی کوژرانی بوو بە هۆی شلبوونی دەستی (حەسەن) لەو خەڵکانەی عێراق کە بە هاوەڵایەتیکردنی (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران شەرەفمەند ببوونو، ماوەیەك لە ژێر چەتری ئاکارە جوانەکانو ڕەوشتە بەرزەکانی ئەو ئارام ببوون، بەڵام پاشان ئاشوبو چاو برینە دونیا سەری لێ تێکدانو لە شارێگای (موستەقیم) لایاندا، ئێمە لێرەدا ئەو جۆرە کەسانە هەڵداوێرین کە لە ئاقار دینەکەیانو خەلیفە مەزنە کۆچکردووەکانیان ڕاستگۆو دڵسۆز بوون، بێگومان کوژرانی (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) گورزێکی گورچوبڕ بوو لە بڕبڕەی پشتی سەردەمی (خیلافەتی ڕاشیدە) دراو پاشانیش بوو بە یەکێك لە هۆکارەکانی کۆتایی پێهێنانی.

**٦ـ کەسایەتی معاویە:**

(حەسەنی کوڕی عەلی) زیاتر لە (٤٠) چل هەزار جەنگاوەری لەگەڵدا بوو، بە مەرجی مەرگ بەیعەتیان پێدابوو، بەم حاڵەوە ئەگەر (معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان) کەسێکی شایستەو لێوەشاوە نەبووایە، ئەوا (حەسەن)ی نەوەی پاكو چاکی پێغەمبەری خودا (ﷺ) پۆستی خیلافەتی ڕادەست نەدەکرد، بەڵکو جەنگی لەگەڵ دەکرد.[1]

---

١ الناهية عن طعن أمير المؤمنين (معاوية) (ص: ٥٧).

ژیاننامەنووسانی ئەو ، سیفەتە جوانو بەرزەکانیو کردارە گەورە زۆرەکانی ئەویان هەژماردوونو باسکردوون، بە ئیزنی خودا لەمەولا لەم کتێبەدا باسیان لێوە دەکرێت.

٧ـ پەشۆکانی سوپای عێراقو خەڵکی کوفە:

دەرچوونی (خەواریج) کاریگەری لەسەر سوپاکەی (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران (خودا لێی ڕازی بێت) داناو لاوازی کرد، هەروەها جەنگەکانی (جەمەل، صەفین، نەهرەوان) بوونە هۆکاری شەکەتبوونو وەڕزبوونی خەڵکی عێراق لە جەنگو کوشتار، بە تایبەتی بە هۆی جەنگی (صەفین)، چونکە جەنگکردنی خەڵکی شام بەجەنگی خەڵکانی تر نەدەچوو، صەفین جەنگێك بوو وەکو ئاش خەڵکێکی زۆری خستە نێو کۆلەئاشی خۆیەوەو قوتی دان، بە جۆرێك کە لە زەینو خەیاڵی ئەوان جودا نەدەبۆوە، ژمارەیەکی زۆر هەتیوو بێوەژن کەوتنە گۆڕێو هیچ ئامانجێکیشیان بەدەست نەهات، خۆ ئەگەر (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران و زۆرێك لە هاوەڵەکانی پێشوازیان لە داخوازی (صوڵحو تەحکیم) نەکردبایە ئەوا کارەساتێکی هێند گەورە بەسەر جیهانی ئیسلامیدا دەهات کە ئەو شوێنەوارە خراپانەی بەهۆی ئەوەوە دەکەوتنەوە بە خەیاڵدا نەدەهاتن، ئەمە لەگەڵ ئەوەدا تاقمەیەکی گەورەی گەڵ (عەلی) هەرچەند دەیانزانی (عەلی) لەسەر هەقە، بەڵام داوەشابوونو ئامادە نەبوون جارێکی تر لەگەڵ ئەو بەرەو (شام) بەڕێ بکەونەوەو پشتیوانی لێ بکەنەوە.[١]

(حەسەن) (خودا لێی ڕازی بێت) لە حاڵەتێکدا پۆستی خیلافەتی وەرگرت کە سوپای عێراق لەنێو خۆیدا پەشۆکاوو شێواو بوو و خەڵکی (کوفە)ش لە بەرانبەر کاروبارەکانیاندا کەوتبوونە دوودڵیو دڵەڕاوکەوە،[٢] هەڵبەتە ئەمە بە ڕەهایی ئاوا نەبوو، بەڵکو دەکرا سوپاکەی (حەسەن) بەهێز بکرێت، هەروەك چۆن چەند کەتیبەیەکی گەورە، کە لەسەروویانەوە کەتیبەکەی (قەیسی کوڕی سەعدی خەزرەجی)و کەتیبەی چەند سەرکردەیەکی تریش دەهاتنە بەرچاوو خۆیان بۆ جەنگ ئامادە کردبوو.[٣]

٨ـ هێزی سوپای معاویە:

لە لایەکی ترەوە (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) هەر لە سەرەتای خیلافەتی (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت)وە، بە ئاشکراو بە نهێنی هەموو هۆکارو ئامرازێکی بۆ لاوازکردنی بەرەی (عێراق) خستبووەگەڕ، پاشانیش ناکۆکیو لێکترازانی نێو سوپاکەی (عەلی) (خودا

---

١ خلافة علي بن أبي طالب، عبدالحميد علي (ص: ٣٤٥).

٢ الشيعة وأهل البيت (ص: ٣٧٩)، نقلا عن الاحتجاج للطبرسي (ص: ١٤٨).

٣ خامس الخلفاء الراشدين الحسن بن علي (ص: ٣٥٩) للصلابي.

لێی ڕازی بێت)ی بە هەل وەرگرت‌و بە باری بەرژەوەندی خۆیدا شکاندەوە، ئەوە هیچ کە هۆکارگەلێك هەبوون‌و هاریکاری بەهێزکردنی بەرەکەی ئەویان دەکرد، وەك: گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەرداری سوپاکەی، یەکدەنگی خەڵکی شام لەسەر پشتیوانی لێکردنی، شارەزایی تەواوی لە حوکمگێڕانی وڵاتی (شام)دا، بەرقەراربوونی سەرچاوە داراییەکانی، دەستنەپاراستنی لە بەخشینی سامان بە خاتری بەدەستهێنانی ئەو ئامانجانەی بە ئیجتیهادی خۆی بە بەرژەوەندی ئوممەتی دادەنان.

## سێیەم: مەرجەکانی صوڵحەکە:

کتێبە مێژووییەکان‌و سەرچاوە تازەکان ئاماژە بۆ چەند مەرجێك دەکەن کە هەردوولا لەسەر یەکیان داناون، مێژوونووسەکان ئەم مەرجانەیان بە پەرش‌و بڵاوی هێناون، هەندێك زاناش هەوڵیان داوە کۆیان بکەنەوەو ڕیزیان بکەن، ئێمە بە سود وەرگرتن لەوان گرنگترین مەرجەکانی ئەو صوڵحە دەخەینەڕوو:

**١ـ پەیڕەوکردنی کتێبی خوداو سوننەتی پێغەمبەرەکەی‌و ڕێوشوێنی خەلیفەکان:**

ژمارەیەك لە زانایان کە (إبن الحجر العسقلاني)یان تێدایە، ئەم مەرجەیان باس کردووە، ئەمەو (إبن الحجر) لە کاتی باسکردنی شێوەی صوڵحەکەی نێوان (حەسەن)و (معاویە)دا دەڵێت: (حەسەن) لەگەڵ (معاویە) پێکهات لەسەر ئەوە: پۆستی سەرپەرشتیاری کاروباری گشتی موسڵمانان (خیلافەت) ڕادەستی (معاویە) بکات‌و (معاویە)ش بە پەیڕەوی کتێبی خوداو پێغەمبەری خودا (ﷺ)و ڕێوشوێنی عەمەلی خەلیفە سەرڕاستە ڕێنماکەرو ڕێنماکراوەکان کاروبارەکانیان بۆ بەڕێوەبەرێت.[1] تا ئەوەی هەندێك کتێبی (شیعە)ش ئەم مەرجەیان باس کردووە، کە ئەمە خۆی لە خۆیدا بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە (حەسەنی کوڕی عەلی) زێڕو تەقدیرێکی هێندە زۆری بۆ (ئەبو بەکر، عومەر، عوسمان، عەلی) هەبووەو پەیڕەوکردنی کردەیی ڕێوشوێنی ئەوانی کردووەتە مەرجێکی سەرەکی بەسەر (معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان)ەوە، مەرجەکە بەم دەربڕینە لە کتێبەکانی شیعەدا هاتووە: ئەو (واتە معاویە) دەبێت کاروباری خەڵك بە پەیڕەوی کتێبی خوداو سوننەتی پێغەمبەرەکەی‌و ڕێوشوێنی کردەیی خەلیفە سەرڕاستەکان هەڵسوڕێنێت.[2] لە نوسخەیەکی تردا بە (خەلیفە

١ الصواعق المرسلة (٣/٣٩٩).

٢ الشيعة واهل البيت (ص: ٥٤).

صاڵحەکان)[١] هاتووە، ئیتر بە هۆی دانانی ئەم مەرجەوە حەسەن: سەرچاوەو پەیڕەوی بۆ دەوڵەتەکەی معاویەی دیاری کرد.

٢ـ سەروەتو سامان:

(بوخاری) لە صەحیحەکەیدا هێناویەوتی کە (حەسەن) بە (عبدالرحمن ی کوڕی سەمورەو عبدالله ی کوڕی عامری کوڕی کریز)ی نوێنەرانی (معاویە)ی وت: ئێمەی ڕۆڵانی (عبدالمطلب) بەشێکمان لەو سەروەتو سامانە بەرکەوتووە... کێ زەمانەتی ئەوەم بۆ دەکات؟ هەردووکیان وتیان: ئێمە.[٢]

لێرەدا (حەسەن) قسە لەو بەشە سامانە دەکات کە پێش ئەم بارودۆخە ئەویشو ڕۆڵەکانی (عبدالمطلب)یش لە (بیت المال) بۆیان دیاری کراوە، بەم مەرجەی دەیەوێت (معاویە) ئەم مافەیان لێ زەوت نەکات، ئەوە هیچ کە لە دانیشتنەکەدا باس لەوە نەکراوە کە (حەسەن) داوا لە (معاویە) بکات لە بەرانبەر صوڵحەکەدا پارەو سامانێکی بداتێ یان بۆ ببڕێتەوە،[٣] بەڵام ئەو ڕیوایەتانەی ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە گوایە بە مەرج دانراوە: (معاویە) ساڵانە یەك ملیۆن درهەم بداتە (حەسەن)و دوو ملیۆن درهەمی تریش بداتە (حوسەین)ی برایو بەشی (بەنو هاشم) لە بەشی (بەنوعەبدشەمس) زیاتر دانێت!. ئیدی ئەم ڕیوایەتانە بە جۆرێك حەقیقەتی صوڵحەکە دەشێوێنن، هەروەکو (حەسەن) خیلافەتی بە پارەو سامان فرۆشتبێت، بە هیچ جۆرێك ئەم جۆرە ڕیوایەتانەو هەموو ئەو لێکۆڵینەوانەی لەسەریشیان ئەنجام دراون قابیلی قبوڵکردن نینو پشتیان پێ نابەسترێت، چونکە بە چەشنێك وێنای (حەسەن) دەکەن کە بەرژەوەندیە زاتیەکانی خۆی پێش بەرژەوەندیە بابەتیەکانی ئوممەت خستبن،[٤] بەڵام سەبارەت بە مافی ئەو لە بەیتولماڵەدا ئەوا دەڵێین: (حەسەن)یش ئەگەر لە تەواوی موسڵمانان زیاتر نەبووبێت کەمتر نەبووە، هیچ شتێکیش ڕێگر نەبووە لەبەردەم ئەوەدا کە بەشی (حەسەن) لە بەشی خەڵکانی تر زیاتر بێت، بەڵام ئەو بەشەی ئەو بۆی دانراوە ناگاتە سەدیەکی ئەوەی ئەم ڕیوایەتانە باسیان کردووە.[٥]

---

١ منتهى الآمال (٢/٢١٢)، نقلا عن الشيعة وأهل البيت (ص: ٥٤).

٢ البخاري، كتاب الصلح رقم (٢٧٠٤).

٣ دراسة في تاريخ الخلفاء الأمويين (ص: ٦٤).

٤ المصدر نفسه (ص: ٦٣).

٥ المصدر نفسه.

٣ـ خوێن:

بە گوێرەی پێکهاتنەکە خەڵکی هەردولا لە خۆیان ئەمین دەبنو کەس بە هۆی تاوانێك یان هەڵەشەیەکی پێشدا ئەنجامی داوە هیچی لەگەڵ ناکرێت، لە ڕیوایەتەکەی (بوخاری)یدا هاتووە: کە (حەسەن) بە وەفدەکەی (معاویە)ی وت: ئەم ئوممەتە دەستیان بە خوێنی یەکتر سوور بووەو خوێنێکی زۆریان لە یەکتر ڕشتووە، جا وەفدەکە دەستەبەری لێبووردنو چاوپۆشیکردنی ئەو خوێنەیان کرد کە ڕژاوە،[1] ئیدی ڕێککەوتن لەسەر ئەوە کە کەس داوای شتێك نەکات کە لە ڕۆژگاری (عەلی)یدا ئەنجامدراوە، گرنگی ئەم بڕیارە لەوەدا دەردەکەوێت کە کەس ئاوڕ بۆ ڕابردوو ناداتەوە کە چی تێدا ئەنجام دراوە، بەڵکو لاپەڕەیەکی سپی تازە هەڵدەدرێتەوەو پێداگیری لەسەر ئێستاو ئایندە دەکات.[2] پێش مۆرکردنی صوڵحەکە لەسەر بنەمای لێبوردنی گشتی پێکهاتنو پاشانیش (معاویە) لە دەوڵەتەکەی خۆیدا کەسی بە تاوانێك سزا نەداوە کە پێش ئەنجامدانی صوڵحەکە ئەنجامی دابێت.

بەم شێوەیە صوڵحەکەی (حەسەنی کوڕی عەلی) لەگەڵ (معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان) لەسەر بناغەی چاکەو لێبوردنو پێکەوە جۆشدانی دڵەکان دامەزرێنرا.

٤ـ ویلایەتی عەهد، یان بەجێهێشتنی پۆستی حوکمڕانی بۆ کۆڕی ڕاوێژ:

وتراوە یەکێك لەو مەرجانەی هەردولا لەسەری پێکهاتن ئەوەیە کە دەبێت دوابەدوای (معاویە) پۆستەکە بۆ (حەسەن) بێت،[3] (معاویە)ش یەکە باریٚ خۆی بەڵێنی داوە ئەگەر شتێکی بەسەربێتو (حەسەن)یش لە ژیاندا مابێت، ئەوا ناوی ئەوی لێ دێنێتو حوکمڕانیەکە بۆ ئەو دەگێڕێتەوە،[4] بەڵام سەبارەت بەمە (إبن أكثم) لە (حەسەن) ڕیوایەت دەکات، کە وتوویەتی: بەڵام من حەز ناکەم دوابەدوای ئەو کاروباری حوکمڕانی بکەوێتە دەستم، ئەگەر بمویستایە ئێستا پێم نەدەدا،[5] لەو دەقەی (إبن الحجر الهيثمي) سەبارەت بە صوڵحەکە هێناویەتی هاتووە:.... بەڵکو دەبێت لە دوای (معاویە) کاروباری حوکمڕانی لەنێو موسڵماناندا بە ڕاوێژو پرسو ڕا بێت.[6] کاتێك لە هەندێك لەو ڕیوایەتانە ورد دەبینەوە کە گوایە (حەسەن) داوای لە (معاویە) کردووە کە دوای ئەو پۆستەکە بۆ خۆی بگەڕێتەوە، ئەوا

---

١ البخاري، كتاب الصلح (٢/ ٩٦٣).

٢ الدور السياسي للصفوة في صدر الاسلام (ص: ٣٤١).

٣ فتح الباري (١٣/٧٠).

٤ سير أعلام النبلاء (٣/٢٦٤).

٥ الفتوح (٤/٤٩٣).

٦ الصواعق المرسلة (٢/ ٢٩٩).

بۆمان دەردەکەوێت ئەم جۆرە داوایانە لەگەڵ نەفسبەرزی‌و هێزو دەسەڵات‌و شکۆداری (حەسەن) دژایەتیان هەیە، باشە چۆن ڕێی تێ دەچێت کە ئەو بە خاتری بەرگرتن لە ڕژانی خوێنی موسڵمانان‌و بەدەستخستنی ڕەزامەندی‌و بەخششەکانی خودا لەوپەڕی لوتکەی دەسەڵات دابەزیبێت‌و پاشانیش لەسەر شتێکی وا پێکهاتبێت کە گوایە بە دوای هۆکارەکانی دونیا کەوتبێت‌و خۆی بۆ چوونەسەر پۆستی خیلافەت ئامادە کردبێتەوە!، بەڵگەمان لەسەر ناڕاستی ئەمە ڕیوایەتەکەی (جبیری کوڕی نفیر)ە کە وتی: بە (حەسەنی کوڕی عەلی)یم وت: خەڵك پێیان وایە کە تۆ (خیلافەت)ت دەوێ؟ لە وەڵامدا وتی: جڵەوی تەواوی سەرانی عەرەب بە دەست منەوەیە، ئاشتی لەگەڵ هەر کەسێك بکەم ئاشتی لەگەڵ دەکەن، شەڕیش لەگەڵ هەر کەسێك بکەم شەڕی لەگەڵ دەکەن، بەڵام من لەبەر خاتری خودا بە یەکجاری وازم لێ هێناوە.[١]

وەکو تێبینی دەکرێت: تاکە کەسێك لە هاوەڵان یان ڕۆڵەکانیان لە کاتی بەیعەتەکەی (یەزید)دا شتێکی لەم جۆرەیان باس نەکردووە، خۆ ئەگەر ئەم شتەی ڕیوایەتەکان دەیڵێن ڕاست بوویێت، ئەوا (حوسەینی کوڕی عەلی) وەکو بەڵگەیەك بەدەری دەخست، بەڵام شتێکی ئاوایان لێ نەبیستراوە، کە ئەمە خۆی لە خۆیدا مەسەلەی مەرجی (خیلافەتی حەسەن)ی دوای (معاویە) ڕەت دەکاتەوەو بە درۆو بێ بنەمای دادەنێ، خۆ ئەگەر (حەسەن) ویلایەتی عەهدی لە لایەن (معاویە)وە پێ بدرایە ئەوا دەبوو لە مەڵبەندی حوکمڕانیەوە نزیك بووایەو ئیدارەی گەورەترین ویلایەتی کردبایەو بۆ (مەدینە)نەگەڕابایەوەو و خۆی لە کاروبارەکانی دەوڵەت دوورەپەرێز نەکردبایە، ئەمە لە لایەك، لە لایەکی تریشەوە کەش‌و هەواو نەریتی ئەو کاتە ئاوا بوو کە دەبێ حکومڕان لە لایەن ئوممەتەوەو لە ڕێگای ئەهلی مەشورەتەوە هەڵبژێردرێت.

## چوارەم: ئەنجامەکانی صوڵحەکە:

ئەمانە گرنگترین ئەنجامەکانی ئەوصوڵحە بوون:

١ـ کۆبوونەوەو یەکبوونی ئوممەت لەژێر ئاڵای یەك سەرکردایەتی.

٢ـ گەڕانەوەی بزووتنەوەی فتوحات بۆ ئەو شوێنەی لێی وەستابوو.

٣ـ دەستبەتاڵبوون‌و یەکلابوونەوەی دەوڵەت بۆ جەنگی (خەواریج).

٤ـ گوێزرانەوەی پایتەختی دەوڵەتی ئیسلامی –لە عێراقەوە– بۆ شام.

---

[١] البداية والنهاية (١١/٢٠٦).

# فەسڵی دووەم:
# بەیعەتدان بە معاویەو گرنگترین سیفەتەکانی و سیستەمی حوکمڕانیەکەی

## باسی یەکەم: بەیعەتدان بە معاویەو گرنگترین سیفەتەکانیو ستایشکرانی لە لایەن زانایانەوە:

### یەکەم: بەیعەتدان بە (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت):

هاوکات لەگەڵ دابەزینی (حەسەنی کوڕی عەلی) (خودا لە خۆیو باوکی ڕازی بێت) لە لوتکەی دەسەڵات لە ساڵی (٤١)ی کۆچیدا، (معاویە) بەوپەڕی ئامادەباشیەوەو پشتئەستوور بە هۆکارگەلێکی بەهێزەوە دەستی لە پۆستی(خیلافەت) گیرکردو وەکو (ئەمیری ئیمانداران) بەیعەتی پێدراو ئەم ساڵەش ناونرا بە (ساڵی جەماعەت).[1]

بەڵێ ساڵی (٤١)ی کۆچی بەهۆی ئەم ڕووداوەیەوە کە تا دنیا دنیایە شانازی پێوەدەکرێت، لە (یادگا)ی ئوممەتی ئیسلامیدا بە ناوی ساڵی یەکێتیو یەکڕیزی موسڵمانان (عام الجماعة) تۆمار کراوە . ئوممەت لە ژێر بەیداخی سەرکردایەتی (معاویە)دا کۆبۆوە، ڕازی بوو کە ئەو سەرۆکی بێت، خەڵکە هەرەباشەکانی ئەم سەردەمە–دوای تێپەڕاندنی قۆناغی ئاشووبو پەرتەوازەیی – بەم یەکێتیو یەکپارچەییە شادومان بوونو گەشانەوە، دیارە ئەمە لە چاکەی خوداوە بوو، ئەمجا لە چاکەی سەییدی مەزنو ئەندازیاری پرۆسەی چاکسازیو ئاشتیخوازی (حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تالیب) بوو، هەروەها (ساڵی جەماعەت) بە یەکێك لە نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی (محمد المصطفى) (ﷺ)و کارە شکۆدارەکانی (حەسەن) دادەنرێت، بە هیچ شێوەیەك نابێت ئاوڕ بۆ لای ئەو بۆچوونەی (عقاد) بدرێتەوە کە هەڵەکارانە هێرش دەکاتە سەر هەموو ئەو مێژوونووسە زۆرانەی ساڵی (٤١)ی کۆچیان بە ساڵی (جەماعەت) ناوبردووەو دەڵێت: هیچ کەسێك بە قەد ئەو مێژونووسانە توشی سەرلێشێوان نەبووە کە ساڵی (٤١)ی کۆچیان بە (ساڵی جەماعەت) ناوبردووە، چونکە لەو ساڵەدا (معاویە) بە تاقی تەنها پۆستی خیلافەتی بۆ خۆی قۆرخ کردووە و کەسی تر لە گەڵ ئەودا کێبەرکەی لە سەر پۆستی ناوبراو نەکردووە و هیچ کامێکیش لە ساڵەکانی یەکەم سەردەمی ئیسلام (صدر الاسلام) بە ئەندازەی ئەو ساڵە

---

[1] سیر أعلام النبلاء (١٣٧/٣)، تاریخ خلیفة (ص: ٢٠٣).

پەرتەوازەیی بە خۆوە نەدیوە.[١] (عقاد) (خوا ڕەحمی پێ بکات) لەم حوکمە هەڵەیدا شتێکی تازەی دانەهێناوە، بەڵکو زۆرێك لە مێژوونووسەکانی (شیعە) لەم بوارەدا پێشی ئەویان داوەتەوە، (معاویە) ئەوەندە شانازییەی بەسە کە هەر هەموو ئەوهاوەڵانەی لە سەردەمی ئەو لە ژیاندا بوون بەیعەتیان پێداوە، ئوممەت بە یەکدەنگ بەیعەتی پێدا، هاوەڵ‌و تابیعیە زاناکان لە پێش هەموو خەڵکەوە دەستی بەیعەتیان خستە نێو دەستەوە، خیلافەتەکەی ئەویان بە شەرعی داناو بە پێشەوایەتیەکەشی ڕازی بوون، بە ڕای ئەوان (معاویە) لەو قۆناغەدا شایانترین کەسە ئەم کارە بەڕێوەبەرێت، لە پێشەوا (ئەوزاعی)یەوە گێڕدراوەتەوە کە وتوویەتی: ژمارەیەك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە سەردەمی معاویەدا ژیاون، لە نێوانیاندا: (سعد، أسامە، جابر، عبداللە ی کوڕی عمر، زەیدی کوڕی ثابت، مسلمەی کوڕی مخلد، أبو سعید ی خدري، رافع ی کوڕی خدیج، أبو أمامة، أنس ی کوڕی مالك‌و ژمارەیەکی زۆر لەمانە بە چەند قات زیاتر) کە هەرهەموویان چرای ڕێنمایی‌و سەرچاوەی زانیاری بوون‌و لە کاتی دابەزینی قورئاندا ئامادەبوون‌و ڕاستەوخۆ لێکدانەوەی ئایەتەکانیان لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) وەرگرتبوو، هەروەها نمونە بۆ ئەو تابیعیانەی کە بە هەق شاگردی هاوەڵان بوون و ئامادەی بەیعەتی سەردەمی (معاویە) بوون : (مسوری کوڕی مخرمة، عبدالرحمن ی کوڕی ئەسوەدی کوڕی عەبد یەغوث، سەعیدی کوڕی موسەییەب، عورووەی کوڕی زوبەیر، عبداللە ی کوڕی موحەیریزو هاوێنەکانیانی ئەمان هەرگیزاوهەرگیز دەستی پەیمانیان لەنێو دەستی یەکێتی‌و دەستەجەمعی ئوممەتی محمد (ﷺ) دانەماڵیوە.[٢]

(إبن حزم) دەڵێت: (حەسەن) بەیعەتی خیلافەتی پێدرا، ئەمجا ئەو ڕادەستی (معاویە)ی کرد، بەبێ جیاوازی ڕای زانایان کەسانێك لەنێو هاوەڵاندا هەبوون لە هەردووکیان چاکتر بوون‌و پێش فەتحی مەککە لە ڕێی خودادا ماڵیان بەخشیبوو و جەنگوجیهادیان کردبوو، هەر هەموویان بە تێکڕایی بەیعەتیان دا بە (معاویە)و ئیمامەتی ئەویان بەسەر خۆیانەوە قبوڵ کرد.[٣] بێگومان هاوەڵان لە خۆڕا بەیعەتیان بە (معاویە) نەداوە، بەڵکو مەرجەکانی پێشەوایەتیان تێدا خوێندووەتەوە کە لە پێش هەموویانەوە مەرجی (دادپەروەری)یە، جا هەر کەسێك توانج لە پێشەوایەتی‌و دادپەروەری (معاویە) بگرێت، ئەوا لە پێشدا توانج لە

---

١ (معاوية) بن أبي سفيان للعقاد (ص: ٢٥).

٢ البداية والنهاية (١١/٤٣٤، ٤٣٥).

٣ الفصل في الملل والنحل (٥/٦).

دادپەروەری تێکڕای ئەو هاوەڵانە دەگرێت‌و بە خائینیان لە قەڵەم دەدات‌و لە پلەو پایەیان دادەبەزێنێت کە بەیعەتیان پێداوە، ئایا دەگونجێت کەسێك ئەم جۆرە کەسایەتیانە لە بواری دین‌و دنیا بە پێشەنگی خۆیانی دابنێن‌و ئێمەش پێی ڕازی نەبین‌و قبوڵی نەکەین؟، هەر کەسێکیش بڵێ هاوەڵان لە ترسان بەیعەتیان پێداوە، ئەوا بە ترسنۆك‌و نەوتنی قسەی هەق تۆمەتباریان دەکات، لە کاتێکدا کە ئەمانە بە خەڵکانێکی وا ناسراون کە ژیانیان پڕە لە هەڵوێستی ئازایەتی‌و جوامێری‌و سالاری‌و بە هیچ شێوەیەکیش لە پێناوی خودادا لە لۆمەی لۆمەکاران نەترساون.[1]

بێگومان لە بەیعەتدانی (حەسەنی کوڕی عەلی)ی نەوەو جگەرگۆشەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) بە (معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان) وانەیەکی کاریگەرو تێگەیشتنێکی قوڵ‌و تەفسیرێکی کرداری هەموو ئەو ئایەتە پیرۆزانەمان دەست دەکەوێت کە ڕێگری لە پەرتەوازەیی‌و ناکۆکی‌و ناتەبایی دەکەن، خودای بەرز دەفەرموێت: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾﴾[2] واتە: ئەمە ڕاستەڕێگەی منەو بەوێدا شوێنپێ هەڵبگرن و شوێن ڕێچکەکان مەکەون، دەنا پەرتەوازە دەبن‌و لە ڕێبازی خوداتان دەکەن، ئەمە وەسێتی خودایە بۆ ئێوە، بەو ئاواتەی پارێز بکەن.

(ڕاستەڕێگا) بریتیە لە: ئیسلام و ئەو سروشتەی خودا لە ئەزەلەوە خەڵکی لەسەر ڕاهێناوە.

(ڕێچکەکان) بریتیە لە: هەواو ئارەزووەکان، تاقمەکان، بیدعەکان، پەیداکراوەکان، (مجاهد) دەڵێت: ﴿وَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلسُّبُلَ﴾ بە ڕێچکەکاندا مەڕۆن، واتە: بیدعەکان‌و گومڕاکان‌و هەموو ئەو شتانە دەبنە مایەی سەرلێشێوان،[3] خوای بەرز ڕێ لەم ئوممەتە دەگرێت بکەوێتە نێو ئەو پەرتەوازەیی‌و ناکۆکیەی ئوممەتانی پێشدا لەگەڵ گەیشتنی پەیامی خودا پێیان تێیکەوتن، خوای بەرزو پاك دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُوا۟ وَٱخْتَلَفُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ

---

١ من سب الصحابة ومعاوية فأمه هاوية (ص: ١٢٠).

٢ الانعام (١٥٣).

٣ تفسير مجاهد (ص: ٢٢٧)، دراسات في الأهواء والفرق والبدع (ص: ٤٩).

ٱلۡبَيِّنَٰتُۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١٠٥﴾﴾[١]، بەڵکو خودا فەرمانی پێ کردوون تێکڕا دەست بە ڕێسمانی نەپسێن (واتە بەرنامە)ی ئەوەوە بگرن، وەك دەفەرمووێت: ﴿وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْۚ﴾[٢] . یەکەم لە چاکەی پەروەردگارەوەو دووەم بە هۆی سەرگرتنی صوڵحەکەی (حەسەنی کوڕی عەلی) لەگەڵ (معاویە)دا یەکێتیو یەککۆمەڵی موسڵمانان هاتەدی کە بە گەورەترین ئامانجی شەریعەتو گرنگترین هۆکاری چەسپاندنی حوکومەتی ئاینەکەی خودا دادەنرێت، ئێمە فەرمانمان پێکراوە: وەسێت بە یەکتر بکەین لەسەر هەق بینو خۆڕاگر بین لەسەری، لەبەر ئەمە دەبێ بانگخوازانو سەرکردەی بزووتنەوە ئیسلامیەکانو زانایانی موسڵمانو فێرخوازانی زانست هەوڵەکانیان لە پێناوی چاککردنەوەی نێوانەکانو ئاشتکردنەوەی ڕاستەقینەی تەواوی چینەکانی ئوممەت یەکبخەن، چونکە-زۆر جا هەیە- چارەسەری بێ (بەرڕەوانی و سەنگوسوکی) نەك چارەی کێشەکەی پێ ناکرێ بەڵکو بۆی هەیە گەورەتری بکات.

(شێخ سعدی) پاش هێنانی کۆمەڵێك ئایەتو فەرموودە لەسەر یەکێتیو پێکەوە جۆشدانو هاریکاری نێوخۆی موسڵمانان، ئەمجا حوکمی واجبوونی ئەم یەکێتیە دەردەهێنێتو دەڵێت کە ئەگەر کەسانێك بەم کارە هەستن جۆرە جیهادێکیان ئەنجام داوە، شێخ دەڵێت: کارو چالاکی پێکەوە جۆشدانی موسڵمانانو پێکەوە بەستنەوەی دڵەکانیانو کۆکردنەوەیان لەسەر دینەکەیانو بەدیهێنانی بەرژەوەندیە دینیو دنیاییەکانیان بە یەکێك لە جیهادە هەرە گەورەکان دادەنرێت.[٣]

بە هیچ کلۆجێك نابێت حیساب بۆ ئەو ڕیوایەتە لاوازە بکرێت کە (إبن عدي) لە ڕێگەی (عەلی کوڕی یەزید)ەوە (کە کەسێکی لاوازە) ئەویش لە (أبو سعد)ەوە هێناویەتی: هەروەها ڕیوایەتەکەی (مجالد)[٤] (کە ئەویش کەسێکی لاوازە)و لە ڕێی (أبي الوداك)ەوەو لە (أبو سعد)ەوە هێناویەتی کە گوایە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: ((إذا رأيتم (معاوية) على منبري فاقتلوه))[٥] واتە: هەر کاتێك معاویەتان لەسەر مینبەرەکەی من بینی بیکوژن.

---

١ ال عمران (١٠٥).

٢ ال عمران (١٠٣).

٣ وجوب التعاون بين المسلمين (ص: ٥).

٤ الكامل في الضعفاء (٢٤١٦/٦).

٥ البداية والنهاية (٤٣٤/١١)، الكامل في الضعفاء (٦٢٦/٢).

مەر ئەم ڕیوایەتە لە ڕێگەی (الحكم بن ظهيرة)[1] شەوە هێنراوە، کە ئەویش کەسێکی مەتروکەو هیچ حیسابێك بۆ ڕیوایەتەکانی ناکرێت، بێگومان ئەم ڕیوایەتە درۆو دەلەسەو بوختانەو، ئەگەر (صەحیح) بووایە ئەوا هاوەڵە بەڕێزەکان بە حوکمی ئەوە هەرگیزاوهەرگیز لەبەر خاتری خودا لە لۆمەی لۆمەکاران نەسڵەمیونەوە بە پەلەو بێ دواکەوتن جێبەجێیان دەکرد.[2]

١ـ کۆتایی هاتنی سەردەمی خیلافەتی ڕاشیدە:

هاوکات لەگەڵ دابەزینی (حەسەنی کوڕی عەلی) لە پۆستی خیلافەتو بەجێهێشتنی بۆ معاویە، سەردەمی خیلافەتی ڕاشیدەی درێژەپێدەری پەیڕەوی پێغەمبەرایەتی لە حوکمڕانیدا کۆتایی پێهات، پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: ((تكون النبوة فيكم ماشاء الله أن تكون، ثم يرفعها الله إذا شاء أن يرفعها، ثم تكون خلافة على منهاج النبوة، فتكون ما شاء الله أن تكون، ثم يرفعها إذا شاء أن يرفعها، ثم تكون ملكاً عارضا فتكون ماشاء الله أن تكون، ثم يرفعها إذا شاء أن يرفعها، ثم تكون ملكاً جبرياً، فتكون ماشاء الله أن تكون، ثم يرفعها إذا شاء، ثم تكون خلافة على منهاج النبوة))[3] واتە: بە ویستی خودا سیستەمی حوکمڕانی پێغەمبەرایەتی لەنێو ئێوەدا بەرقەرار دەبێت تا ئەو کاتەی بۆ خۆی دەیەوێت، هەر کاتێك ویستی لەسەر بوو هەڵی دەگرێتەوەو دەیپێچێتەوە، ئەمجا بە ویستی خودا سیستەمی حوکمڕانی خیلافەت لەسەر سیستەمی پەیڕەوی پێغەمبەرایەتی لەنێوتاندا بەرقەرار دەبێت، هەر کاتێك ویستی لەسەر بوو هەڵی دەگرێتەوە، ئەمجا سیستەمی حوکمڕانی دەگۆڕێت بۆ مەلیکایەتیەکی وا کەسانێك دانی لێ گیر دەکەنو نایەڵن لە دەستیان دەرچێت، ئەوەندەی خوا ویستی لەسەر بێت دەمێنێتەوە، ئەمجا هەر کاتێك خودا ویستی کرد لولپێچی دەکات، ئەمجا سیستەمەکە لەمەشەوە دەگۆڕێت بۆ مەلیکایەتیەکی خۆسەپێنی تۆبزیکار، ئەوەندەی خودا ویستی لەسەر بێت درێژە دەکێشێت، ئەمجا ئەگەر خودا ویستی لەسەربێ نایهێڵێتو، ئەویش هەڵدەگرێتەوە، ئەمجا سیستەمی خیلافەت لەسەر پەیڕەوی حوکمڕانی پێغەمبەرایەتی بەرقەرار دەبێتەوە)، ئەمجا پێغەمبەر (ﷺ) بێدەنگ بوو.

---

١ الكامل في الضعفاء (٦٢٦/٢، ٦٢٧).

٢ البداية والنهاية (٤٣٤/١١).

٣ مسند أحمد (٣٧١/٤، ٣٧٢)، سلسلة الأحاديث الصحيحة.

پێغەمبەر (ﷺ) تیشکی زیاتر دەخاتە سەر هەواڵەکەو دەفەرموێت: ((خلافة النبوة ثلاثون سنة، ثم يؤتي الله الملك، أو ملكه ما يشاء))[1] واتە: جێنشینایەتی کردنی پۆستی حوکمڕانی پێغەمبەرایەتی سی ساڵە، ئەمجا خودا پۆستی دەسەڵات دەبەخشێت یان بە ویستی خۆی دەسەڵاتی خۆی دەبەخشێت بە هەر کەسێك بیەوێت، هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((الخلافة في أمتي ثلاثون سنة، ثم ملك بعد ذلك))[2] واتە: سیستەمی حوکمڕانی خیلافەت لەنێو ئوممەتی من سی ساڵە، ئەمجا دەگۆڕێت بۆ مەلیکایەتی، بێگومان سەردەمی خیلافەتی ڕاشیدە بە ماوەی حوکمڕانیەکەی (حەسەنی کوڕی عەلی) بەوە سی ساڵەکەی تەواو کرد، ئەو لە مانگی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی چلو یەك لە پۆستی خیلافەت هاتە خوارەوە، بەمە سی ساڵی تەواو بەسەر مەرگی پێغەمبەری خودا (ﷺ)دا تێپەڕی، چونکە ڕێك لە مانگی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی یانزەدا کۆچی دوایی کردووە، ئەم هەواڵە یەکێکە لە بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرمان (ﷺ).[3] بەم شێوەیە دابەزینی (حەسەن) (خودا لێی ڕازی بێت) لەو پۆستەو بەجێهێشتنی بۆ (معاویە) لە ڕەبیعی یەکەمی٤١ی کۆچیدا قۆناغی جێنشینایەتی سیستەمی حوکمڕانی پێغەمبەرایەتی کۆتایی پێهات، فەرموودە پیرۆزەکەی پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژە بە چەند قۆناغێکی مێژوویی دەدات، کە ئەمانەن:

أـ سەردەمی پێغەمبەرایەتی.

ب ـ سەردەمی خیلافەتی ڕاشیدە.

جـ سەردەمی مەلیکایەتی.

دـ سەردەمی مەلیکایەتی خۆسەپێن.

س ـ سەردەمی (خیلافەت)ێك کە بە سیستەمی (پێغەمبەرایەتی) بەڕێوە دەچێ.

پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: ((يكون المُلك نُبوَّةً ورحمة، ثم تكون خلافة ورحمةً، ثم يكون ملكٌ ورحمةٌ ثم ملك وجبرية ثم ملك عضوض))[4] واتە: حوکمڕانی لە دینی ئیسلامدا سەرەتا پێغەمبەرایەتیو ڕەحمەت دەبێت، ئەمجا دەبێتە خیلافەتو ڕەحمەت، ئەمجا دەبێتە مەلیکایەتیو ڕەحمەت، ئەمجا دەگۆڕێت بۆ مەلیکایەتیو خۆسەپێنی، ئەمجا دەبێتە مەلیکایەتیو ستەمکاری.

---

١ سنن أبي داود، شرح عون المعبود (١٢/٢٥٩)، صحيح سنن الالباني (٣/٨٨٩).

٢ سنن الترمذي، شرح تحفة الأحوذي (٦/٣٩٥ـ٣٩٧)، حديث حسن.

٣ البداية والنهاية (٨/١٦).

٤ سنن الدارمي–الاشربة (٢/١١٤)، الفتاوى (٣٥/١٤).

ناوبردنی ئەو دەسەڵاتدارانەی لە دوای خەلیفە ڕاشیدەکانەوە هاتوون بە (خەلیفە) دروستەو کێشەی تێدا نیە، ئەگەر (مەلیك)یش بووبنو خەلیفەی پێغەمبەرانیش نەبووبن، بەڵگە لەسەر ئەمە ئەو فەرموودەیەیە کە(بوخاریو موسلیم) لە (ئەبو هورەیرەوە) دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: ((كانت بنو إسرائيل يسوسهم الانبياء، كلما هلك نبيٌّ خلفَهُ نبيٌّ ، وإنه لا نبيَّ بعدي، وستكون خلفاء فتكثر)) قالوا: فما تأمرنا؟ قال: ((وفُو ببيعة الأول فالأول، وأعطوهم حقّهم، فإن الله سائلهم عما إسترعاهم))[١] واتە: (بەنو ئیسرائیل) پێغەمبەرەکانیان کاروباری حوکمیان بۆ هەڵدەسوڕاندن، هەر کات پێغەمبەرێك کۆچی دوایی دەکرد پێغەمبەرێکی تر جێی دەگرتەوە، بێگومان من هیچ پێغەمبەرێکم بەدوادا نایەت (تا جێم بگرێتەوە)، لەمەولا خەلیفە دێنو زۆریش دەبن، وتیان: کەواتە چ فەرمانێکمان پێ دەفەرمووی: فەرمووی: بەرانبەر بە بەیعەتو پەیمانی یەك لە دوای یەکیان وەفاداری بنوێننو مافەکانی خۆیان پێ بدەن، بێگومان خودا دەربارەی ڕەعیەتەکانیان لێپێچینەوەیان لەگەڵ دەکات.

بەڵام فەرموودەی (فتكثُر)= زۆریش دەبن، بەڵگەیە لەسەر ئەوە دەسەڵاتدارانێکی زۆرو زەوەندو بەدەر لە خەلیفە ڕاشیدەکان، چونکە ئەوان زۆر نەبوون، هەروەها ئەم فەرموودەیەی: ((وفُو ببيعة الأول فالأول))= بەرانبەر پەیمانی یەك لە دوایەکیان وەفادار بن، بەڵگەیە لە جیاوازیو ناتەباییان، چونکە خەلیفە ڕاشیدەکان ناکۆكو جیاواز نەبوون، هەروەها ئەم فەرموودەی: ((وأعطوهم حقّهم، فإن الله سائلهم عما إسترعاهم))= (مافەکانی خۆیانیان پێ بدەن، خودا سەبارەت بە ڕەعیەتەکانیان لێیان دەپرسێتەوە)، بەڵگەیە لەسەر بیروڕای مەزهەبی (ئەهلی سوننەتو جەماعەت) سەبارەت بە پێدانی پارەو سامان بە دەسەڵاتداران.[٢]

جا (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) شکۆدارترینو چاکترین مەلیك بووە لەنێو مەلیکانی ئەم ئۆممەتە، دەسەڵاتدارەکانی پێش ئەو لە بواری حوکمڕانیدا درێژەپێدەری سیستەمی پێغەمبەرایەتی بوون ، بەڵام جێنشینایەتی ئەو مەلیکایەتی بووە، مەلیکایەتیەکەشی مەلیکایەتیەکی بە ڕەحمەت بووە، لە ژێر سایەی مەلیکایەتی معاویەدا: سۆزو بەزەییو

---

١ البخاري، رقم (٣٤٥٥).

٢ الفتاوى (٣٥/١٥).

ئەرمونیانیو سوودگەیاندن بە موسڵمانان باو بوو، بە جۆرێك لە هەموو مەلیكێك باشترو چاكتر بووە.[1]

(معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) كەسێكی زاناو خۆپارێزو دادپەروەر بوو، ئەو لە پلەو پایەی زانیاریو خۆپارێزیو دادپەروەریدا لە دوای خەلیفە ڕاشیدەكانەوە دێتو، چۆن وەلیان یان فریشتان یان پێغەمبەرانی خودا پلەو پایەیان لەنێو خۆیاندا جیاوازی هەیەو هەیە بەرزترە لەوەی تر، بە هەمان شێوەش پلەو پایەی (معاویە) نزمترە لە هی خەلیفە ڕاشیدەكانی پێش خۆی، هەرچەندە بە كۆڕای هاوەڵان حوكمڕانیەكەی ئەو كە لە لایەن (حەسەن)ەوە ڕادەستی كرا ڕاستو دروست بوو، بەڵام لە ڕووی ئەوە لەسەر سیستەمی خیلافەت نەمایەوە، ئەو لە ڕووی خەریكبوون بە موباحەكانی دونیاوە (كە چوار خەلیفەكان خۆیان لێ دەبوارد) دەستی خۆی كردبوونەوە، هەرچی چوار خەلیفە ڕاشیدەكان بوون لە بوارەكانی عیباداتو موعامەلاتدا دیاربوو چیان پەسند دەكرد بەسەر چداو هەڵسوكەوتەكانیان بێ پەردەو بێ پێچو پەنا بوون.[2]

(إبن خلدون) ئاستی گۆڕانكاریەكە دیاری دەكات، پێی وایە هەرچەندە خیلافەت گۆڕابوو بۆ مەلیكایەتی، بەڵام واتاكانی خیلافەت لەنێو سیستەمەكەدا مابوونەوە، ئەوەی گۆڕانی بەسەردا هات تەنها سەرۆكی حكومەتو دارو دەستەكەی بوونو بەس، دوای ئەوەی ئەم شكڵو شێوە لەسەر بنەمای دینداری حیسابی بۆ دەكرا، ئەوا لەم قۆناغەی دوایە لەسەر بنەمای دەمارگیریو تایەفەگەریو شمشێر حیسابی بۆ دەكرا،مەبەستی ئەوەیە: دوای ئەوەی هەڵسوكەوتو ڕەفتارەكانیان پاڵنەری ئایینی لە پشتەوە بووو خیلافەت بە ڕاوێژ بوو، ئەوا حوكمڕانی پشتی بە دەمارگیریو هێزو دەسەڵات دەبەست، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا واتاكانی خیلافەت، واتە ئامانجو مەبەستەكانی هەر مابوونەوە، بە واتایەكی تر: بەردەوام مەبەستەكانی ئەو مەلیكایەتیە بەدیهێنانی ئامانجو مەبەستەكانی دین بوو و حوكمی بە گوێرەی شەریعەتی ئیسلامیو بە دادپەروەرانە دەگێڕاو هەموو ئەو ئەركو واجباتانەی بە ڕێكوپێكی جێبەجێ دەكردن كە ئیسلام فەرمانی پێ كردبوون،[3] ئەمجا ئەو (واتە ئیبن خەلدون)دێ قۆناغەكانی خیلافەت كورت دەكاتەوەو دەڵێ: ڕوون بۆوە كە سەرەتا

---

١ الفتاوى (٤٠/٢٩٢).

٢ الناهية عن طعن أمير المؤمنين (معاوية) (ص: ٧٨).

٣ النظريات السياسية للريس (ص: ١٩٤)، نقلا عن المقدمة لإبن خلدون.

خیلافەت) بەبێ بوونی (مەلیك‌و مەلیكایەتی) پەیدا بوو، پاشان واتاكانی خیلافەت تێكەڵ بە (مەلیكایەتی) كران، ئەمجا (مەلیكایەتی) تاك بۆوە – بەو چەشنە كە خیلافەت (واتە پۆستی حوكمڕانی)بوو بە مەلیكایەتیەكی تەواو و لە سەر دو بنەمای پشتاوپشت ومولْكداری دامەزرا– ، خودا شەوو ڕۆژان هەڵدەسوڕێنێت.[1]

(یەكەم قۆناغ) كە ئاماژەی پێ دەكات، ئەوە قۆناغی سەردەمی (خەلیفە ڕاشیدەكان)ە، كە خیلافەتی خۆلاسەو تەواو عەیارە.

(قۆناغی دووەم) سەردەمی (خەلیفەكانی ئومەوی‌و عەباسی)یەو–هیچ ڕێگرێكیش نیە كە سەردەمی خەلیفەكانی عوسمانیش بخرێنە نێو ئەم قۆناغەوە– ، ئەم خیلافەتە تێكەڵە بە مەلیكایەتی، یان مەلیكایەتیەكی تێكەڵ بە خیلافەتە: واتە ئەو ئامانجانەی لەو سەردەمەدا كاری هێنانەدییان بۆ ئەنجام دەدرا ئامانجی خیلافەت بوون.

بەڵام (قۆناغی سێیەم) ئەوە سەردەمی مەلیكایەتیەو بەس، واتە مەبەستی حوكمڕانیە كە تەنها خۆ لە بەدیهێنانی ئامانجە دنیاییەكاندا دەنوێنێت‌و بە تەواوەتی خۆی لە واتاو نێوەڕۆكی خیلافەت داماڵیوە، ئەمە بریتی بوو لەو پێناسەو لێكدانەوەی (إبن خلدون)ی شارەزا لە فیقهو مێژوو خستبوونیەڕوو سەبارەت بەو ئاڵوگۆڕانەی بەسەر (خیلافەت)دا هاتوون.[2]

بێگومان خیلافەتی ڕاستەقینەو تێرو تەواو یان جێنشینانی پێغەمبەر (ﷺ) بریتیە لە سەردەمی (خەلیفە ڕاشیدەكان)و سی ساڵی تەواوی خایاند، پاشان بەرەو (مەلیكایەتی) گۆڕا، بەڵام بۆ ئەوەی ڕاستی بخەینەڕوو، پێویستە چاودێری خودی سنووردارکردنەکە بكرێت، ئەویش ئەوەیە: كە (بە هاتنە پێشەوەی) سیستەمی مەلیكایەتی، خیلافەت بە یەكجاری لەنێو نەچووو هەڵنەگیرایەوە، بەڵكو ئامانج‌و مەبەستەكانی وەكو خۆیان مانەوە، گۆڕان تەنها لەو بناغەدا ڕوویدا كە خودی سیستەمی حوكمڕانیەكەی لەسەر دامەزرێنرا، بەڵام نێوەڕۆكی خیلافەتەكە بە دەست لێ نەدراوی مایەوە، كەواتە گۆڕانەكە هەمەكی نەبووە بەڵكو هەندەكی بووە، واتە: (خیلافەت) لە سەردەمی یەكەمدای میسالی ونموونەیی بووە، بەڵام دوایە (واتە لە سەردەمی دووەمدا) ئەو نموونەییە لە هەندێك ڕوویەوە لێی كەم

---

١ المصدر نفسه (ص: ١٩٥).

٢ المصدر نفسه (ص: ١٩٥).

کرایەوە، بەڵام زۆرینەی ڕەگەزەکانی وەکو خۆیان مانەوە، بەمە خیلافەت لە پایەی بەرزی دابەزێنرا، یان خیلافەت بووو تێکەڵ بە مەلیکایەتی کرا.[1]

ڕای گشتی لە ئیسلامدا بۆ سیستەمی حوکمڕانی دەست بە (نموونە) یان بە (جێنشینانی پێغەمبەر (ﷺ)) یان بە (خیلافەتی خۆلاسەو تەواوعەیار)ەوە دەگرێت: کە لەسەر بنەمای (ڕاوێژو هەڵبژاردنی گشتی ئوممەت) دادەمەزرێت، بەڵام ئەگەر بارودۆخ یان هۆکارگەلێکی کۆمەڵایەتی گۆڕانی بەسەر جۆری ئەم سیستەمەدا هێنا، ئەوا واقیعەکە کاتییەو لە ڕووی ناچاریەوە قبوڵ دەکرێت‌و بە نەمانی ئەو هۆکارانەو پێچرانەوەی ئەو بارودۆخە گەڕانەوە بەرەو بەدیهێنانی (نموونە بەرزەکە) پێویست دەبێت، هەر لەبەر ئەمەشە کتێبە ئیسلامیە ڕەسەنەکان بەردەوام پابەندن بە ئەم سیستەمەوەو حوکمەکانی فەرمانڕەوایەتی تەنها لە ئەو دەردەهێنن‌و جیاوازی دەخەنە نێوان (خیلافەت) کەخیلافەتێکی ڕاستەقینەی شەرعی بێت‌و (خیلافەتی واقعی) کە کەم تا زۆر و بە شێوەیەکی ڕێژەیی لە هەقیقەت دوورکەوتبێتەوە.[2]

(إبن تیمیة) دەڵێت: چارەنووسی گۆڕانی (خیلافەت) بۆ (مەلیکایەتی) بە تەنها بەڵگە نیە لەسەر کەموکوڕی مەلیکەکان‌و جێگرو قازی‌و والیەکان وتەواوی دارو دەستەکانیان، بەڵکو بەڵگەیە لەسەر کەموکوڕی ئەوان‌و تەواوی ڕەعیەتەکانیان، چونکە بەپێی بنەمای (کما تکونوا یولَّ علیکم= ئێوە چۆن‌و چ جۆر بن هی وا سەرپەشتیتان دەکەن)، خودای بالادەست دەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّي بَعْضَ الظَّالِمِينَ بَعْضًا بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٢٩﴾﴾[3] واتە: بەم شێوەیە کاربەدەستانێکی ستەمکار بەسەر خەڵکانێکی ستەمکاردا زاڵ دەکەین بە هۆی ئەو تاوانانەی ئەنجامی دەدەن، دەوڵەتی (خەلیفە ڕاشیدەکان) ڕۆیشت، خیلافەت بەرەو مەلیکایەتی گۆڕا، کەموکوڕی لە سەرکردەو ئەمیرەکان‌و زانایان‌و دیندارانەوە دەرکەوت، جەماوەری هاوەڵان بە پێچرانەوەی خیلافەتی چوار خەلیفەکان بەرەو نەمان چوون، تا ئەوەی چەند کەسێکی کەم لەوانەی لە جەنگی (بەدر)دا بەشداریان کردبوو مابوونەوە، تابیعیەکانیش (ئەوانەی بە ڕێکوپێکی شوێنپێی هاوەڵانیان هەڵگرتبوو) لە سەردەمی هاوەڵانی منداڵ‌و لە سەردەمی خیلافەتی (عبداللە ی کوڕی زوبێر)و (عبدالملك)دا بەرەو

---

١ المصدر نفسه (ص: ١٩٦).

٢ النظريات السياسية (ص: ١٩٧).

٣ الانعام (١٢٩).

نەمان‌و کۆچی دوایی چوون، (تابیعی تابیعیەکان)یش لە ساڵانی دوایی دەوڵەتی (ئومەوی)و ساڵانی سەرەتای دەوڵەتی (عەباسی)دا بەرەو نەمان چوون.[١]

٢ـ ئایا (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) لە ڕیزی (١٢) خەلیفەکان دەژمێردرێت؟

لە (جابری کوڕی سەمورە)وە، دەڵێت: بە هاوڕێیەتی باوکم چوومە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) گوێم لێی بوو دەیفەرموو: ((إنَّ هذا الأمر لا ینقضي حتی یمضي فیهم إثناعشر خلیفة)) واتە: ئەم دەسەڵاتە حوکمڕانیە تا دوانزە خەلیفە کاری تێدا نەکەن کۆتایی پێ نایەت، دەڵێت: ئەمجا پێغەمبەر (ﷺ) بە ئەسپایی فەرموودەیەکی بە گوێدا چرپاند، دەڵێت: بە باوکم وت: چی پێ فەرمووی: وتی: فەرمووی: ((کلهم من قریش)[٢] واتە (ئەم خەلیفانە) هەر هەموویان لە هۆزی قورەیش دەبن.

لە ڕیوایەتێکی تردا هەر لە (جابر)ەوە ئەویش لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((لا یزال الاسلام عزیزاً الی إثني عشرة خلیفة، کلهم من قریش))[٣] واتە: بەردەوام ئیسلام تا ڕابواردنی دوانزە خەلیفە (کە هەرهەموویان لە قورەیش دەبن) لە لوتکەی دەسەڵاتدا دەمێنێتەوە.

لە ڕیوایەتێکی ترداو هەر لە (جابر)ەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((لا یزال هذا الدین عزیزاً منیعا الی إثني عشر خلیفة–کلهم من قریش–))[٤] واتە: بەردەوام ئەم دینە تا تەواوبوونی حوکمڕانی دوانزە خەلیفە (کە هەموویان قورەیشی دەبن) لە قەڵای مەحکەمی دەسەڵاتدارێتیدا دەمێنێتەوە.

(أبو داود) لە (سنن)ەکەیدا ڕیوایەتەکە درێژ دەکاتەوەو دەڵێت: (جابر) (خودا لێی ڕازی بێت) وتی: کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) گەڕایەوە ماڵ، تاقمەیەك لە قورەیش هاتنە خزمەتی‌و وتیان: پاش ئەمە چ دەبێت؟ فەرمووی: ((ثُمَّ یکون الهرج))[٥] واتە: ئەمجا ئاشوب‌و پشێوی‌و کوشتار ڕوودەدات.

(إبن کثیر) واتای ئەم فەرموودەی لێکداوەتەوەو دەڵێت: واتای ئەم فەرموودەیە: مژدە دەدا بە هاتنی دوانزە خەلیفەی چاك‌و پاکی وا کە هەق بەرپا دەکەن‌و بە دادپەروەری حوکم

---

١ الفتاوی (٢٠٧/١٠).
٢ صحیح مسلم علی شرح النووي (٥٠٢/١٢).
٣ المصدر نفسه (٥٠٣/١٢).
٤ المصدر نفسه (٥٠٣/١٢).
٥ صحیح سنن الالباني (٣/ ٨٠٧).

لەنێو ئوممەتدا دەگێڕن، فەرموودەکە بە دوایەکدا هاتنی ئەم خەلیفانەی بە مەرج نەگرتووە، چوار لەمانەی فەرموودەکە باسیان دەکات لەسەر یەك هاتوون کە هەر چوار خەلیفەی سەرڕاست (أبوبکر، عمر، عوسمان، عەلی)ن (خودا لێیان ڕازی بێت) بە لای ئیمامانی ئەهلی سوننەتەوە: (عومەری کوڕی عبدالعزیز)یش بێ شكو گومان لە ڕیزی دوازدەکە دەژمێردرێت، هەندێك لە خەلیفەکانی عەباسیش دێنە نێو ئەم جوغزەوە، قیامەتیش بەرپا نابێت تا هەر دوازدە خەلیفەکە حوکم نەگێڕن، وەکو چەند فەرموودەیەکیش باسیان لێوە کردووە (مەهدی) موژدە لەسەردراویش لە ڕیزی ئەواندایە، ئەم مەهدیە ئەو (مەهدیە مونتەزەر)ە نیە کە ڕافیزەکان پێیان وایە خۆی لە کونی (سامەڕا)[1] هاویشتووەو ڕۆژێك دەبێت بێتە دەرەوە، بەڵکو ئەمە فڕی بەسەرڕاستیەوە نیەو بوونیشی نیە، بەڵکو ئەمە بیروبۆچوونێکی پووچی خەڵکانێکی بێ ئاوەزەو، واهیمەی خەیاڵە بەتاڵەکانیانە، هەروەها مەبەست لەم (دوانزە خەلیفە)یە ئەو (دوانزە ئیمامە) نیە کە (مەزەبی دوازدە ئیمامە)ی شیعە باوەڕیان لەسەرە،[2] ئەگەر بە شێوەیەکی بێلایەنانەو بابەتیانە لە دەقی فەرموودەکە ڕامێنین، دەبینین کە: ئەم دوانزە خەلیفە پۆستی (خیلافەت) دەگرنە دەستو کاروباری دەوڵەت هەڵدەسوڕێنن، لە سەردەمی ئەواندا (ئیسلام) لە لوتکەی دەسەڵاتو قەڵای دامەزراودایە، خەڵك لە دەورەیان کۆدەبنەوەو گوێڕایەڵیان لێ دەکەنو کاروباری خەڵك بە ڕێکوپێکیو چاكو پاکی بەڕێوەدەبرێت، هەموو ئەو سیفەتو وەسفانەی سەبارەت بەم (دوانزە خەلیفە) خرانەڕوو، بەسەر ئەو (دوانزە) کەسەدا ناچەسپێن کە فیرقەی (دوازدە ئیمامە) بە ئیمامی خۆیان حیساب دەکەن، لەم دوازدە کەسانەی ئەوان ناویان دێنن جگە لە ئەمیری (عەلی)ی ئمیری ئیمانداران و(حەسەن)ی کوڕی کەسی تریان پۆستی خیلافەتی نەگرتۆتەدەست.[3]....

ئەمجا فەرموودەکە بەم شێوازەی ئەوان باسی دەکەن ئیمامەتی لە دوازدە نەفەری ئاوادا کورت هەڵنەهێناوە، بەڵکو فەرموودەکە هەواڵدانێکە لە لایەن پێغەمبەری خودا (ﷺ)ەوە کە: (ئیسلام) لە سەردەمی حوکمڕانی ئەمانەدا لە لوتکەی دەسەڵاتدا دەبێت، سەردەمی خەلیفە ڕاشیدەکانو ئومەویەکان سەردەمانی عیززەتو دەسەڵات بوون،[4] هەر لەبەر ئەمە

---

١ (سامەڕا): شارێکە کەوتووەتە نێوان بەغداو تکریت لە باری خۆرهەڵاتی (دیجلە)وە.

٢ تفسیر إبن کثیر (٢/٣٤).

٣ منهاج السنة (٤/٢١٠) المنتقی (ص: ٥٣٢).

٤ أصول الشیعة (٢/٨١٦).

(ابن تیمیه) دەڵێت جێبەجێکرانو پەیڕەولێکرانی ئیسلامو بنەما دەستوورییەکانی زیاترو چاکتر لە ئومەویەکاندا ڕەنگی دابۆوە وەك لە سەردەمانی دوای خۆیدا،[1] ئەمەو (ابن تیمیە) (معاویە)ی بە یەکێك لەو کەسانە حیساب کردووە کە فەرموودەکە مەبەستنی.[2]

## دووەم: گرنگترین سیفەتەکانی (معاویه) (خودا لێی ڕازی بێت):

(معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) بە چەندین سیفەت بەناوبانگ بوو، لەنێو ئەم سیفەتانەدا:

**١ـ فیقهو زانست:**

(معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) لەو ماوەی لە خزمەت پێغەمبەری خودا (ﷺ)دا بوو، لە بواری زانستو پەروەردەدا سوودێکی زۆری وەرگرت، فەرموودەیەکی زۆری لێوە ڕیوایەت کردوون کە پێشدا هەندێکیانمان باسکردن، (بوخاریو موسلیم) کە بە مەرجیان گرتووە جگە لە کەسانی بڕواپێکراوی ڕاستگۆی مێشك سافی دەرخکار نەبێت لە کەسانی ترەوە ڕیوایەت نەکەن،[3] (إبن عباس) شایەدی لەسەر فیقهو زانیاری شەرعی (معاویە) داوە، لە (ئەبی مەلیکە)وە وتی: بە (إبن عباس) (خودا لێی ڕازی بێت) وترا: ئایا دەربارەی زانستی (معاویە)ی ئەمیری ئیمانداران ڕات چۆنە؟ ئەو تەنها یەك ڕکات سوننەتی (وتر) دەکات؟ وتی: پێکاویەتی چونکە ئەو زانایە،[4] ڕاڤەکاران دەڵێن: واتە: (معاویە) (موجتەهید)ە، هەر (بوخاری) لە (ئەبی مەلیکە)وە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) لە دوای نوێژی خەوتنان بە یەك ڕکات نوێژی ویتر تەواو دەکات، لەو کاتەدا خزمەتکارێکی (إبن عباس) (خودا لێی ڕازی بێت) لەوێ دەبێت، دێتە لای (إبن عباس) (خودا لێیان ڕازی بێت)و باسی دەکات، (إبن عباس) دەڵێت: وازی لێ بێنە، ئەو هاوەڵایەتی پێغەمبەری خودا (ﷺ)ی کردووە، (إبن عباس) لە هاوەڵە هەرە ڕێزدارەکانەو لەبەر زانستە بەرفراوانەکەی بە نازناوی (بەحر، حبر الامة ،ترجمان القرآن) ناوی دەرکردووە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) داوای لە خودا کردووە زانستو حیکمەتو ڕوونکردنەوەی قورئانی پێ ببەخشێت، نزاکەشی بۆ قبوڵ بوو، لە لایەکی ترەوە (إبن عباس) لە هاوەڵە نزیكو تایبەتەکانی (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) بوو، بە توندو تیژی لە دژی دوژمنەکانی دەجوڵایەوە، (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) ناردی

١ منهاج السنة (٤/٢٠٦).
٢ المصدر نفسه (٤/٢٠٦).
٣ الناهية عن طعن أمير المؤمنين (معاوية) (ص: ٤١).
٤ البخاري، رقم (٣٧٦٤)، رقم (٣٧٦٥).

گفتوگۆ لەگەڵ (خەواریج)دا بکات، بە بەڵگەی بەهێز توانی بەهانەیان ببڕێتو یەك بەڵگەشیان پێ نەهێڵێت، جا کەسێکی ئاوا شایەدی بۆ (معاویە) بداتو بڵێ کە زاناو موجتەهیدەو بە بەڵگەی ئەوەی کە هاوەڵایەتی پێغەمبەری خودا (ﷺ)ی کردووە خزمەتکارەکەی بێدەنگ بکات، دەبێت ئەم شایەتیدانە بۆ (معاویە) چەند بەسوود بێت،[1] هەروەکو چۆن ئەو کاتبی پێغەمبەری خودا (ﷺ) بووەو وەحی بۆ نووسیوەتەوە، (أحمد بن عبدالله بن محمد الطبري)ی موفتی هەردوو حەرەمی (مەککەو مەدینە) لە کتێبی (خلاصة السير)دا دەڵێت: کاتبانی پێغەمبەر (ﷺ) سیانزە (١٣) کەس بوون: (هەر چوار خەلیفەکە، عامری کوڕی فەهیرە، عبدالله ی کوڕی أرقم، أُبيٌّ کوڕی کعب، ثابتی کوڕی قیسی کوڕی شماس، خالدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص، حەنزەلەی کوڕی ڕەبیعی ئەسلەمی، زیدی کوڕی ثابت، معاویەی کوڕی أبی سفیان، شرحبیلی کوڕی حسنة)، (معاویە)و (زید) پابەندترین کەس بوون بە کارەکەوەو تایبەتترین کەسیش بوون بە خودی پێغەمبەرەوە (ﷺ)،[2] هەردووك چۆن زانایان پشت بە ئیجتیهادەکانی دەبەستنو وەکو تەواوی هاوەڵان ڕایەکانی باس دەکەن وەکو ئەم وتەیەیان: (معاذی کوڕی جبلو معاویەو سعیدی کوڕی مسیَّب) ڕایان وایە موسڵمان میراتی کافر دەگرێت،[3] یان ئەم وتەیەیان: دەستلێدانی هەردوو (ڕوکنی یەمانی) لە (حەسەن) یان (حوسەین)ەوە ڕیوایەتکراوەو، بە (صەحیحی) لە ڕێی (معاویە)وە هاتووە. (أبو درداء)ی هاوەڵ (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) بە خەڵکی شامی وت: کەسم نەدیتووە نوێژەکەی بە نوێژی پێغەمبەری خودا (ﷺ) بچێت جگە لە نوێژی ئەم ئیمامەتان (واتە معاویە)،[4] (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) پێداگیری زۆری دەکرد لەسەر پەروەردەکردنو فێرکردنی خەڵك، لە (أبي أمامة: سەهلی کوڕی حنیف)ەوە وتی: گوێم لە (معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان) بوو کاتێك لەسەر مینبەرەکەی دانیشتبوو بانگبێژ بانگی دەدا، کاتێك بانگبێژ وتی: (الله أكبر الله أكبر)، معاویەش وتی: (الله أكبر الله أكبر) وتی: (أشهد أن لا الە الا الله) معاویەش وتی: منیش شایەدی دەدەم، وتی: (أشهد أن محمداً رسول الله) (معاویە)

---

١ الناهية عن طعن أمير المؤمنين (معاوية) (ص: ٤١).

٢ المصدر نفسه (ص: ٤١).

٣ المصدر نفسه (ص: ٥٧).

٤ منهاج السنة (٣/١٨٥).

وتی: منیش، کاتێك بانگەکە تەواو بوو، وتی: ئەی خەڵکینە: گوێتان لێبوو چۆنم وەڵامی بانگەکە دەدایەوە، من گوێم لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بوو کە بانگ دەوترا ئاوای وەڵام دەدایەوە.[1]

ئەو (خودا لێی ڕازی بێت) بەردەوام حەزی دەکرد، بەڵکو کاری شێلگیرانەی دەکرد تا خەڵك چاکتر لە دین شارەزا ببن و هانی دەدان و ئەو فەرموودانەی بۆ دەگێڕانەوە کە بەڵگەبوون لەسەر گرنگی حاڵی بوون لە ئایین، لە (الزهری)یەوە وتی: (حمید) هەواڵی پێدام و وتی: (معاویە) وتاری دەداو گوێم لێ بوو دەیوت: گوێم لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بوو دەیفەرموو: ((من یرد الله به خیرا یفقهه في الدین، وإنَّما أنا قاسم، ویعطي الله، ولن یزال أمر هذه الأمة مستقیما حتی تقوم الساعة، أو حتی یأتي أمر الله))[2] واتە: ئەگەر خودا ویستی چاکەیەك لەگەڵ بەندەیەکیدا بنوێنێت شارەزای (دین)ی دەکات، کاری من تەنها بەخشکردنی زانستەکەیە، خوداش تێگەیشتن دەبەخشێت بە کەسێك کە بیەوێت، بەردەوام کاروباری ئەم ئوممەتە ڕێکوپێكو ڕاوەستاو دەبێت هەتا قیامەت هەڵدەستێ یان فەرمانی خودا دێت.

ئەو (خودا لێی ڕازی بێت) نامە گۆڕینەوەی بەردەوامی لەگەڵ هاوەڵاندا هەبوو، حەزی دەکرد لێیانەوە فێربێتو لەو فەرموودانە بزانێت کە ئەوان لە پێغەمبەریانەوە بیستوون، لە (وراد)ی خزمەتکاری (موغیرەی کوڕی شوعبە)وە، وتی: (معاویە) نامەی بۆ (موغیرە) ناردبووو بۆی نوسیبوو: هەرچییەکت لە پێغەمبەر (ﷺ)ەوە بیستووە کە لە دوای نوێژ فەرمووبێتی بۆم بنووسەوە. (موغیرە)ش بە منی وت بۆی بنووسە: وتی: گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو لە دوای نوێژ دەیفەرموو: ((لا إله إلا الله وحده لا شریك له، أللهم لا مانع لما أعطیت ولا معطي لما منعت، ولا ینفع ذاالجد منكل الجد))، واتە: جگە لە (ألله) هیچ شتێك شایستەی پەرستن نیە، تەنهاو بێ هاوەڵە، خودایە: هەرچ شتێك ببەخشی ڕێگری لە بەردەمدا نیە، هەرچ شتێك بگریەوە بەخشەری دەست ناکەوێت، دەسەڵاتدار لە لای تۆ دەسەڵاتەکەی سودی پێ ناگەیەنێت، (إبن حریج) وتی: چەند کەسێك هەواڵیان داومێ کە ئەم

---

١ فتح الباري (٢/٤٦٢).

٢ فتح الباري (١٢/٣٠٦).

فەرموودەیەیان لە (وراد)ەوە پێگەیشتووە، ئەمجا بەسەردان چووەمە لای (معاویە)، گوێم لێی بوو فەرمانی بە خەڵك دەکرد ئەم ویردو زیکرە لە دوای نوێژەکانیان بخوێنن.[1]

(معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) لەسەر شوێنهەڵگرتنی سوونەتی پێغەمبەر (ﷺ) سوور بوو، لە (سەعیدی کوڕی موسەیب)ەوە، لە (حەمدی کوڕی عبدالرحمن ی کوڕی عەوف)ەوە وتی: (معاویە) لە دواهەمین سەردانی بۆ شاری (مەدینە) لەسەر مینبەری پێغەمبەری خودا (ﷺ)ەوە وتی: ئەی دانیشتوانی شاری (مەدینە) زانایەکانتان لە کوێن؟ لەم ڕۆژەدا (ڕۆژی عاشورا گوێم لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بوو دەیفەرموو: ((من شاء منكم أن يصومه فليصمه)) واتە: کێ لە ئێوە دەیەوێت تێیدا بەڕۆژوو بێت با تێیدا بەڕۆژوو بێت، لە ڕیوایەتێکی تردا ((وإني صائم)) واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەوا من (تێیدا) بەڕۆژوم، جا خەڵك نیەتیان هێناو تێیدا بەڕۆژوبوون.[2]

هەروەها (معاویە) وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بوو کە ڕێگری لە وێنەی ئەم شتە کردووە، قولەمێك قژی بە دەستەوە گرت‌و وتی: کاتێك ژنەکانی بەنی ئیسرائیلی ئەمەیان بەکارهێنا (واتە قژی زیادەیان بەسەر قژی خۆیانەوە نا کە ئیمڕۆ پێی دەوترێت قژی صەناعە، ئەوا زەردو زەبوون بوون و بەرەون لەنێوچوون چوون.[3] واتە: قژی زیادەیان بە سەری خۆیانەوە دەنوساند، ژمارەیەك فەرموودەی صەحیح نەفرین لەو ئافرەتە دەکەن قژی زیادە بەسەری ژنانەوە دەلکێنێت‌و نەفرین لەو ئافرەتەش دەکەن داوا دەکات قژی زیادەی بۆ بەسەریەوە بلکێنن، لە ڕیوایەتێکی تردا پێی وتن: ئێوە دەزانن چ نەریتێکی خراپتان داهێناوە، خۆ پێغەمبەری خودا (ﷺ) نەهی لە تەزویر کردووە،[4] پێغەمبەر (ﷺ) –قژلکاندنی– بە (زور) واتە (درۆ) ناوبردووە: چونکە تەزویرو گۆڕانکاری تێدایە.

ئالێرەدا دەبینین‌و بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) چەندە سوور بووە لەسەر ژیاندنەوەی سوونەتێك –کە سوونەتی بەڕۆژووبوونی ڕۆژی (عاشورا)یەو خەڵك پشتگوێی خستووە، لە لایەکی ترەوە چەندە پێداگیر بووە لەسەر مراندن‌و نەهێشتنی

---

١ فتح الباري (١٢/٥٢١).
٢ فتح الباري (٤/٢٨٧).
٣ فتح الباري (٦/٥٩١).
٤ الفتح (٦/٥٩٥).

نەریتێکی خراپ کە لە نێو خەڵکی موسڵماندا سەری هەڵداوەو، نەریتەکەش بریتیە لە (قژلکاندن)و لاسایی کردنەوەی دابو نەریتی ژنانی جوولەکەیە.[١]

(عبدالرحمن کوڕی هورموزی ئەعرەج) دەگێڕێتەوە: کە (عباسی کوڕی عبدالله ی کوڕی عباس)و (عبدالرحمنی کوڕی حەکەم) بە کچەکانی خۆیان ژن بە ژنەیان کردو خودی کچەکانیان کردنە مارەیی (عەقدەکە)، (معاویە) نامەی بۆ (مەروان) نووسی‌و فەرمانی پێدا: لێکیان جودا بکاتەوە، لە نامەکەیدا نووسیبووی: ئەمە خودی ئەو (شیغار)ەیە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) قەدەغەی کردووە.[٢]

ئەو دەیەویست ژیانی خەڵك لە هەموو بوارەکاندا: (تاکی، خێزانی، کۆمەڵایەتی) بەپێی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) بەڕێوە بچێت.[٣]

لە هەر بۆنەیەکدا چ فەرموودەیەکی پێویست بووایە ئەو جۆرە فەرموودەی تێدا دەخوێندەوە، جارێك دەچێتە شوێنێكو بەسەر (عبدالله ی کوڕی زوبێر)و (إبن عامر)دا دەچێت، (إبن عامر) لەبەری هەڵدەستێت‌و (إبن زوبێر) هەڵناستێت، (معاویە) ڕوو لە (إبن عامر) دەکات‌و دەڵێت: نەکەی هەستی، پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ أحب أن يمثل له عبادالله قياماً، فليتبوأ مقعده من النار))[٤] واتە: هەر کەسێك حەز دەکات بەندەکانی خودا بە پاوە لە بەرانبەری خۆڕانوێنن، با جێگای خۆی لەنێو ئاگردا خۆش بکات. لە (موجاهیدو عەطا)وە، ئەوانیش لە (إبن عباس)ەوە وتی: (معاویە) هەواڵی پێدام کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە عومرەدا قژی بە مقەست کورت دەکردەوە، وتمان: ئەم هەواڵەمان لە (معاویە)وە نەبێت لە کەسی تر پێ نەگەیشتووە ! (إبن عباس) وتی: (معاویە) کەسێك نیە تۆمەت بۆ پێغەمبەری خودا (ﷺ) دروست بکات‌و بوختانی بۆ هەڵبەستێت.[٥] زۆری بایەخ بە دەورکردنەوەی زانست دەداو داکۆکی لەسەر دەکرد، لە (عبدالله ی کوڕی حارث)ەوە وتی: لەگەڵ (إبن عباس) سەردانی (معاویە)مان کرد (عبدالله)ی لەسەر دۆشەکێك دانیشاندو لەم بەسەرهاتەدا (معاویە) سەبارەت بە مەسەلەیەکی فیقهی پرسیارێکی ئاڕاستەی (عبدالله) کرد، ئەو (خودا لێی ڕازی بێت) خەڵکی فێری زانست دەکردو هانی دەدان پرسیاری لێبکەن‌و سود

---

١ تاريخنا المفترى عليه للقرضاوي (ص: ٧١).

٢ مسند أحمد، رقم (١٦٨٥٦)، إسناده حسن.

٣ تاريخنا المفترى عليه للقرضاوي (ص: ٧١).

٤ البخاري، رقم (٣٤٨٨).

٥ مسند أحمد، رقم (١٦٨١٣)، إسناده صحيح.

لە زانستەکەی وەریگرن، ڕۆژێکی (جەمعە) وتارێکی داو وتی: ئەی خەڵکینە: ئەو قسەی من بخەنە مێشکی خۆتانەوە، ئەمڕۆ سەبارەت بە کاروبارەکانی دنیاو دوارۆژ کەسێکی لە من شارەزاترتان دەست ناکەوێت، ڕووەکانتانو ڕیزەکانتان لە نوێژدا ڕێکوپێك بکەن، یان دەبێ ڕووەکانتانو ڕیزەکانتان لە نوێژدا ڕێکوپێك بکەن، یان خودا جیاوازی دەخاتە نێو دڵەکانتانەوە، یان دەستی خراپەکاری گێلو نەفامەکانتان توند دەگرن، یان خودا ئەوانتان بەسەردا زاڵ دەکاتو خراپترین شێوەی سزاتان پێ دەچێژێت، ماڵ ببەخشن، با کەس نەڵێ: کەم دەرامەتم، بەخشینی کەسێکی کەم دەرامەت لە بەخشینی دەوڵەمەند باشترە، خۆ لە بوختانکردن بۆ ژنانی پاکداوێن بپارێزن، وەك ئەوە کەسێك بڵێ: گوێم لێ بووو هەواڵم پێدرا ئاوایان وت: ئەگەر یەکێك لە ئێوە بوختان بۆ ژنێکی سەردەمی (نوح) بکات، ئەوا خودا لە قیامەت لێی دەپرسێتەوە.[1]

داکۆکی لەسەر شوێنهەڵگرتنی هەنگاوەکانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەکرد، کاتێك چووە (مەککە)، پرسیاری لە (عبدالله کوڕی عومەر) کرد: پێغەمبەر نوێژی لە کوێ کرد؟ وتی: ئەندازەی دوو باڵ یان سێ باڵ بخە نێوان خۆتو دیوار-ی بەیت-ەوە.[2]

سەبارەت بە دیاریکردنی شەوی (قەدر) ڕای تایبەتی خۆی هەبوو، (إبن أبي شيبة) بە سەنەدێکی (صحيح) لە (معاويە)وە ڕیوایەتی کردووە کە وتوویەتی: شەوی (٢٣) شەوی قەدرە.[3]

هەر کەسێك بە بەڵگەوە قسەی کردبایە بۆی دەسەلماند، لە (إبن عباس)ەوە گێڕدراوەتەوە: کە لەگەڵ (معاويە) تەوافی کردووە، (معاويە) دەست لە هەموو ڕوکنەکانی بەیت دەدا، (إبن عباس) پێی دەڵێت: ئەم دوو ڕوکنانە دەستیان لێ نادرێت، (معاويە) دەڵێت: هیچ شتێك لە (بەیت)دا بە خۆڕایی بەجێ نەهێڵراوە،[4] لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: (إبن عباس) پێی دەڵێت: ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾[5] واتە: ڕاستو دروست لە هەڵسوکەوتەکانی پێغەمبەری خودادا (ﷺ) پێشەنگیەکی ڕێکوپێك بۆ ئێوە هەیە، (معاويە) وتی: ڕاست دەکەی.[6]

---

١ البداية والنهاية (١١/٤٧٣).

٢ الفتح (٣/٥٤٤).

٣ الفتح (٤/٣١١).

٤ الخلافة الراشدة والدولة الأموية من فتح الباري (ص: ٥٨٥).

٥ الاحزاب (٢١).

٦ الخلافة الراشدة والدولة الأموية من فتح الباري (ص: ٥٨٦).

هەندێك لەو حوكمانەی (معاویه) فتوای لەسەر داون: (إبن أبي شيبة) لە ڕێگای عبدالله ی كوڕێ معقل)ەوە هێناویەتی كە وتوویەتی: هیچ فتوایەكم لە فتوای (معاویه) بە ڕێكوپێكتر نەهاتووەتە بەرچاو كە دەڵێت: چۆن بۆمان حەڵاڵە هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتانی (ئەهلی كیتاب)دا بكەینو بۆ ئەوان حەڵاڵ نیە هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتانی ئێمەدا بكەن، بە هەمان جۆر: میراتی (خزمەكانی خۆمان) لە ئەهلی كیتاب دەگرین، بەڵام ئەوان میراتمان ناگرن.[١]

ژمارەیەك لەو مەسەلە فیقهیانەی لە دوای (معاویه) (خودا لێی ڕازی بێت) وەكو شوێنەوار بۆمان بەجێ ماون:

أـ سوننەتی نوێژی (وتر)ی بە یەك ڕكات ئەنجام داوە.[٢]

ب ـ هەر كەسێك دەركەوێت كە دیندارو چاكەخوازە دەكرێت بە هۆی ئەوەوە داوای بارینی باران لە خودا بكرێت.[٣]

ج ـ نیو جام گەنم لە بری سەرفترە دەكەوێت.[٤]

دـ سوننەتی بۆن لەخۆدان پێش چوونە نێو ئیحرامەوە.[٥]

هـ ـ دروستبوونی كڕینو فرۆشتنی خانوبەرەی مەككە.[٦]

وـ لێكجیاكردنەوەی ژنو مێرد بە هۆی شلەپەتەیی پیاو.[٧]

زـ كەوتنی تەلاقی سەرخۆش (مەست).[٨]

ح ـ نەكوشتنەوەی موسڵمان لە تۆڵەی كوشتنی كافردا.[٩]

طـ بەندكردنی (بكوژ) تا باڵقبونی كوڕی كوژراوەكە.[١٠]

---

١ مصنف إبن أبي شيبة (٣٧٤/١١)، سنن سعيد (٤٥/١).
٢ فتح الباري (١٣٠/٧).
٣ المغني (٣٤٦/٣).
٤ زاد المعاد (١٩/٢).
٥ المغني (٧٧/٥).
٦ المغني (٣٦٦/٦).
٧ زاد المعاد (١٨١/٥).
٨ زاد المعاد (٢١١/٥).
٩ المغني (٤٦٦/١١).
١٠ المغني (٥٧٧/١١)، مرويات خلافة (معاوية) في تاريخ الطبري (ص: ٢٨ـ٢٩).

بەڵام سەبارەت بە (فیقهی سیاسیو سیاسەتی شەرعی)ی معاویەو شارەزابوونی لەسەر (ئامانجە شەرعیەکان)و (فیقهی جیهاد)و (دەوڵەتداریو بەدیهێنانی ئامانجەکانی)، لەمەولا باسی لێوە دەکرێت.

٢ـ سینگ فراوانیو لێبوردەیی:

(معاویە)ی ئەمیری ئیمانداران (خودا لێی ڕازی بێت) بە سیفەتی ئاقڵمەندیو سینگ فراوانیو لێبوردەیی ناوبانگی دەرکردبوو، تا ئەوەی نەرمونیانیەکەیو قوتدانەوەی ڕقەکەیو لێبوردنەکەی بە نموونە دەهێنرێتەوە، (إبن کثیر) سەبارەت بەمە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: یەکێك وتی: پیاوێك قسەیەکی ناخۆشو توندوتیژی بە گوێی (معاویە)دادا، پێی وترا: دەبوایە زەبرێکت لێدابایەو تەنبێت کردبایە، وتی: من شەرم لە خودا دەکەم بازنەی ئاوەزم لە بەرانبەر گوناهەی ئەندامێکی ڕەعیەتەکەم تەسك بکەمەوە!، لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: پیاوێك پێی وت: ئەی ئەمیری ئیمانداران تیاح کە نەرمونیانی!!، وتی: من شەرم دەمگرێت گوناهی کەسێکی ئاوا لە ئاقڵی من گەورەتر بێت. (ئەصمەعی) لە (ثوری)یەوە دەگێڕێتەوە: (معاویە) وتی: من شەرم دەکەم گوناهێك (کە دەرهەقم ئەنجام دەدرێت) لە لێبوردنو چاوپۆشی من گەورەتر بێت یان نەفامیەك لە ئاوەزم مەزنتر بێت، یان عەیبو عارێك نەتوانم بە پەردەی سەماحەتی خۆم داپۆشم، (معاویە) وتی: ئەی ڕۆڵەکانی (ئومەییە) لەنێو هۆزی قورەیشدا خۆتان بە سیفەتی نەرمونیانیو سینگ فراوانی جیا بکەنەوە، سوێند بە خودا لە سەردەمی جاهیلیدا یەکێك دەهات جنێوی زۆری پێ دەدام، منیش سینگی خۆم بۆ بەرفراوان دەکرد، کاتێك پەشیمان دەبۆوەو دەبوو بە برادەرم، ئەگەر هاوارم تێ بەستایە بە فریام دەکەوت، ڕقم هەستابایە وەك من ڕقی هەڵدەستا، نەرمونیانیو سینگ فراوانی مرۆڤی پایەبەرز لە پایەی خۆی دانابەزێنێت، تەنها ڕێزی بۆ زیاد دەکات. هەروەها وتوویەتی: هیچ مرۆڤێك ئاوەزی پڕ نابێتو نابێتە خاوەن ڕای خۆی هەتاکو: ئەقڵی بەسەر نەفامیەکەیدا زاڵ نەبێت، مرۆڤ تەنها بەهێزی ئاوەزو ڕۆشن فکریو سینگ فراوانی دەگات بەمە.[1] پرسیار لە (معاویە) کرا کێ لە هەموو کەس سەروەرترە؟ وتی: کەسێکە کە سواڵی لێکرا لە هەموو کەس دڵاواترە، کە لە مەجلیس دانشت ڕەوشتی لەهی هەموو کەس جوانترە، کە بە نەفامی ڕەفتاری لەگەڵ کرا، لە هەموو کەس ئاقڵترو سینگ فراوانترە.[2]

---

١ البداية والنهاية (١١/٤٤١).

٢ المصدر نفسه (١١/٤٤٢).

(أبو عبيدة معمر ابن المثنى) دەڵێت: (معاويـە) بـە زۆری پەنـدی بـە ئـەم بەیتـە شـیعرانە دەهێنانەوە:

فما قتـل السـفاهـة مثل حلم | يعود به على الجهل الحليم
فلا تسفه وإن ملئتَ عند ذنب | على أحـد فإن الفحش لؤم
ولا تـقـطـع أخـالك عند ذنب | فـإن الذنب يـغفر الكـريم[1]

(معاويە) نامەیەکی بۆ (زیاد)ی کاربەڕێوەبەری نوسی: کارێکی دروست نیە خەڵك بە یـەك جۆرە سیاسەت ڕەفتاریان لەگەڵ بکرێـت، ئەگـەر بـە نـەرمونیانی لەگـەڵیان بجوڵێیتـەوە لـە فەرمان دەردەچن، ئەگەر بە توندو تیژیان لەگەڵ بکەی لـەنێو دەچـن، بـەڵام تـۆ بـا ڕەقـیو توندیو گشتیت پێوە دیار بێت، منیش بۆ نەرمیو هۆگریو سۆزو بەزەیی لێگەڕێ، ئەمە بـە خاتری ئەوە ئەگەر یەکێك لە خۆی ترسابا دەرگایەکی دەستکەوێتو پێیدا بچێتە ژوورەوە.[2]

ئەم وتانەی لە (معاويە)ی ئەمیری ئیماندارانەوە (خودا لێی ڕازی بێت) گێڕدرانـەوە دەری دەخـەن: کـە ئـەو تـا چ ڕادەیەك بـە سـیفەتی نـەرمونیانیو سـینگ فراوانـی نـاوو ناوبـانگی دەرکـردووە، ئـەم ڕەوشـتەی ئاڵقـەی بەیەکگەیـشتنی ئـەو بـوو لەگـەڵ ئـەو کەسـانەی نێـو ڕەعیەتەکەی کە بە وشكو برینگی ڕەفتاریان لەگەڵ دەنواندو ئەو شتەی کە بۆ خۆیان پێیان وابوو هەقە بە ڕەقیو ڕاشکاوی بە گوێیان دادەداو ئەویش لەمـەدا ڕای جیـاواز بـوو، ئـەو بـە هـۆی ئـەم خوخدەیـەوە (کـە بـە لاوازی تێکـەڵ نـەکردبوو) تـوانی پایـەکانی دەوڵەتەکـەی دامەزرێنێتو ڕقو تورەیی خەڵکانی نارەزا بنیشێنێتەوەو، بـە سیاسـەتی زیرەکانـەی ڕازیـان بکاتو قەناعەتیان پێ بێنێت، بەم شێوەیە ڕەوشتە بـەرزەکان کـە (نـەرمونیانیو لێبـوردنو ئارامگرتنو بەخـشندەیی) گرنگترینیـانن دەبنـە گـرنگترین ڕەگـەز بـۆ پۆسـتی سـەرۆکایەتی کردن، لەم قسانەوە وا دەردەکەوێت کە نەرمونیانی کەمێك لە پەسـتی تێکـەڵ دەبێـت چـۆن سەرکەوتن کەمیك لە دەسەڵاتی تێکەڵ دەبێت، بەڵام (معاويـە) شـادمانی خـۆی لـە بەرانبـەر ئـەو کەمـە داماویـەدا دەردەخـا کـە حەتمـەن بەرهـەمی خـۆی دەبێـت، ئـەویش خـۆی لـە پەیداکردنو ڕاکێشانی هاوڕێیانو پشتیوانانـدا دەبینێتەوە.[3]

---

١ المصدر نفسه (٤٤٢/١١).
٢ المصدر نفسه (٤٤٣/١١).
٣ التاريخ الاسلامي (٢٦/١٧).

ئـەو لـەو نامەیـەدا کـە بـۆ (زیـاد)ی والی (عێـراق)ی نوسـیوە: سیاسـەتی (زیرەکانـەو سەرڕاستانەی خۆی) ڕوون دەکاتەوە، بە جۆرێك کە ئاشوبگێڕان لـە بەرانبـەر نانـەوەی هـەر پشێویەك کە زیان لە هێمنایـەتی‌و ئـارامی بـدا دەترسـێنێت‌و چـاو ترسـاویان دەکـات، بـەلام هاوکات لەگەڵ ئەمەدا هیوایەك دەبەخشێت بـەو کەسـانەی ئـەم کارانـە ئـەنجام دەدەن، کـە ئەگەر بێتو پەشیمان ببنەوەو ڕێی ڕاست‌و ڕێك‌و ئاشتی ڕەوچا بکەن ئەوا دەروازەی لێوردنی ئەو لە بەرانبەریاندا ئاوەلایە.[1]

زانایان‌و حەکیمانی سەردەمی خۆی ستایشی (معاویە)ی ئـەمیری ئیمانـداران (خـودا لێـی ڕازی بێت)یان کـردووەو باسـی ڕەوشـتە بـەرزەکانی ئـەو بـە تایبـەتی (نـەرمونیانی‌و سـینگ فراوانی)یەکەیان کردووە، (إبن کثیر)ی (حافظ) سەبارەت بەمە دەلێـت: ڕۆژێـك (عبـدالملك ی کـوڕی مـەروان) (معاویـە)ی بـەبیر دێتـەوەو دەلێـت: کەسـم لـە نـەرمونیانی‌و بـارقولی‌و بەخشندەییدا بە وێنەی ئەو نەدیتووە.[2] (قبیصەی کوڕی جابر) وتی: کەسم نـەدیوە وەکـو: (معاویە): ئاوەزی مەزن بێت‌و سەروەرایەتی زۆر بێت‌و سینگ فراوان‌و چاکەخواز بێت.[3]

(عبـدالله ی کـوڕی زوبێـر) دەلێـت: نامـەخوا کوڕەکـەی (هینـد) چـەند ئـازا بـوو ئەگـەر بمانویستایە بیترسێنین، ئەوا هیچ شێرێکی چەنگ بە خوێن بە قەد ئەو ئازا نەبوو تـا ئـەوەی لێمان ترسابایە، ئەگەر بمانویستایە تەفرەی بدەین‌و هەلی بخەلەتێنین، ئەوا کوڕی هیچ ژنێك لەم سەر زەوییەدا بە قەد ئەو زاناو داناو فێلزان نەبوو هەتا پێمان هەلخەلەتابایـە، سـوێند بـە خوا هەتا ئەو چیایە (واتـە أبـو قبـیس) بـەردێکی پێـوە دەمـا حـەزم دەکـرد بمابایـەو لێـی سوودمەند بووینایە.[4]

وەصفێکی وردی (معاویە) لە وتەکانی (عبدالله ی کوڕی زوبێر)دا بەدی دەکرێت: (معاویە) لەگەڵ ئەوەدا ئازاو بـە جـەرگ‌و بـە سـامە، بـەلام بـە خـاتری نەوروژانـدنی هەسـت‌و نەسـتی یـارانی‌و هەلنەگەڕانـەوەی ئـەوان لـە دژی خـۆی، هەولـدەدات ئـەم سـیفەتە بـشارێتەوەو بـە سیفەتی خۆشڕەفتاری‌و نـەرمونیانی لەگـەڵ سـەران‌و گـەورەپیاوانی موسـلمان هەلسوکەوت بکات، ئەو لەگەڵ ئەوەدا بیرتیژترین‌و زیرەکترین کەسە لە سەردەمی خۆیدا، بەلام لە پێناوی

---

١ التاريخ الاسلامي (٢٦/١٧).
٢ البداية والنهاية (٤٣٩/١١).
٣ البداية والنهاية (٤٣٩/١١).
٤ البداية والنهاية (٤٤٢/١١).

وشـككردنی سەرچـاوەی خەشـمو قینــی دژەبـەرەكانی، خـۆی بـە كەسـێكی هەڵخەڵـەتاوو تەفرەخواردووی دەسـتی ئـەوان نیـشان دەدات، ئـەو لـە هـەموو ئـەم ڕەفتارانەیـدا خزمـەتی بەرژەوەندی باڵای موسڵمانانو بەدیهێنانی ژیانێكی خۆشو كامەرانی بۆ ئوممـەتی ئیـسلامی دەكرد، هەر لەبەر ئەمە بوو (عبدالله ی كوڕی زوبێر) خۆزگـەی دەخواسـت تەمـەنی (معاویـە) درێژ بێتەوە، چونكە دەترسا بە نەمانی ئەو بارودۆخەكان گۆڕانیان بەسەردا بێت.[1]

(عبدالله ی كوڕی عەباس)ی كەڵـەزانای ئوممـەتی ئیـسلام (خـودا لـە خـۆیو بـاوكی ڕازی بێت) بە وتەیەكی پوختو نەختو پڕ واتا وەصفی سیاسەتی (معاویە) دەكاتو دەڵێت: بـۆم دەركـەوت كـە (معاویـە) چـۆن بـوو بـە سـەروەری خـەڵك، ئەگـەر ئـەوان باڵیـان لێكـدەدانو دەفڕین، ئەو دەنیشتەوە، ئەگەر ئەوان دەنیشتنەوە ئەو دەفڕی.[2] ئەمە ئەوە دەگەیەنێت كە ئەگەر لافاو دەهات خۆی لە بەرانبەر ڕانەدەگرت، بەڵكو ڕێـی بـۆ چـۆڵ دەكـرد تـا تێپـەڕێت، ئەمجا مەیدانەكەی بۆ خۆی قۆرخ دەكـردو ئـەو هەڵەداوانـەی خـەڵك پێـشدا بـۆی دەكـرد لـە گۆڕێـدا نـەمابووو ئـەمجا چـی بویـستایە دەیتـوانی بـە دەسـتی بخـات، (معاویـە) بـەم وتـە بەناوبانگەی خۆی وێنای سیاسەتی خۆی دەكات: ئەگەر موویەكی باریك لەنێوان منو خەڵكدا هەبووبێت نەمهێشتووە بپـسێت، ئەگـەر ڕایانكێـشابێت لـە دوامـداون، ئەگـەر لـە دوویانـدا بم ڕامكێشاوە: یەكێك لە هەڵوێستە نەرمونیانەكانی: گفتوگۆیەك لەنێوان (معاویـە)و پیاوێـك بـە ناوی (أبوجهم)دا ڕوویدا، (ئەبو جەهم) قسەیەكی توانجنامێزی لـە بەرانبـەردا كـرد، (معاویـە) كەمێك سەری داخـستو ئـەمجا بـەرزی كـردەوەو وتـی: ئـەی (ئـەبا جـەهم) لـە دەسـەڵاتدار وریابە، چونكە تورەبوونەكەی بە تووڕەبوونی منـداڵ دەچـێت، بـەڵام گرتنەكـەی بـە گرتنـی شێر دەچێت، كەمێك تووڕە بوونو گرتنـی ئـەو بەسـەر خـەڵكێكی زۆردا زاڵ دەبێـت، ئـەمجا فەرمانی دا بارگەیماڵو سامان بۆ (أبو جهم) بپێچنەوە، (ئەبو جەهم) سەبارەت بەمە بـەم شێوەیە ستایشی (معاویە) دەكات:

نمیل علی جــوانبه كأنا — نمیل إذا نمیل علی أبینا
نقلّبه لنخـبر حـــالــته — فنخبر منهما كرما ولینا[3]

---

١ التاريخ الاسلامي (٢٧/١٧).
٢ البداية والنهاية (٤٤٣/١١).
٣ التاريخ الاسلامي (٢٨/١٧)، البداية والنهاية (٤٤٠/١١).

بەم شێوەیە نەرمونیانی‌و سەماحەت‌و چاوپۆشی‌و خۆشخوڵقی‌و وەڵامدانەوەی خراپە بە چاکەی (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) شوێنەوارێکی گەورە لەسەر دڵ‌و دەروونی کەسێکی وەکو (أبو جهم)دا دەنێت‌و بەم دوو دێڕە بەیتە ستایشی دەکات‌و پێی هەڵدەڵێ.

بێگومان (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) بە ڕەوشتە بەرزەکەی خۆی دەیەویست فەرموودە پیرۆزەکانی خودا بخاتە قاڵبی کردارەوە، خوای بەرز دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلَا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ ﴿٣٤﴾ وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا الَّذِينَ صَبَرُوا وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٣٥﴾﴾[1] واتە: هەرگیز چاکەو خراپە یەکسان نابن، بە چاکترین چاکە بەرپەرچی خراپە بدەوە، کاتێك دەبینی ئەو کەسەی لەگەڵ تۆ نێوانی ناخۆشەو دوژمنایەتی هەیە وەکو دۆستێکی گیانی بە گیانی لێ دێت، جگە لەو کەسانەی دان بە خۆدا دەگرن‌و دارای بەشێکی گەورەی (ڕەوشتی بەرزو ئاکاری چاك‌و پاکن) کەسی تر بەم پلەو پایە بەرزە ناگات.

هەر لەبەر خاتری ئەم سیفەتە بەرزانەی (ئازایەتی‌و نەفسبەرزی‌و نەرمونیانی) ئەو بووە کە (عومەری کوڕی خەتاب)ی ئەمیری ئیمانداران (خودا لێی ڕازی بێت) بەم وتەیەی ستایشی کردووە:[2]

واز لە لاوی (قورەیش)و کوڕی گەورەکەی بێنن، ئەو ئەو کەسەیە لە کاتی تووڕەبووندا پێکەنینی دێت‌و بە پێخۆشبوونی خۆی نەبێت هیچی لێ ناسەندرێت‌و، مەگەر لە ژێر پێیەکانیەوە دەنا لە باری سەریەوە زەفەری پێ نابرێت.[3]

ئەم وتەیەی (عومەر) سەبارەت بە وەسفی (معاویە) تا بڵێی واتادارە، بە پیاوێکی پایەبەرزو نەرمونیان‌و نەفسبەرزو بەدەسەڵاتی دادەنێت، کە مەحاڵە کەسێکی ئاوا لە حاڵەتی تووڕەیی‌و هەڵچوندا هیچ شتێکی لێ دەستگیر بکرێت، ئەمە یەکێك بوو لە ڕیزی ئەو سیفەتانەی کە وای لە (عومەر)ی ئەمیری ئیمانداران کرد (معاویە) لە سەنگەرە سەختە سەرسنووریەکەی (شام) بە فەرماندەو کاربەڕێوەبەر بێڵێتەوە.[4]

---

١ فصلت (٣٤_٣٥).

٢ التاريخ الاسلامي (١٧/٢٩_٣٠).

٣ البداية والنهاية (١١/٤١٥).

٤ التاريخ الاسلامي (١٧/٣٠).

(معاويه) (خودا لێی ڕازی بێت) وتی: ئاوەزو سینگ فراوانی باشترین نیعمەتە درابێت بە بەندە، بە هۆی ئەم نیعمەتەوە ئەگەر خودای بەبیرهێنرایەوە زیکر دەکات، ئەگەر پێی بەخشرا سوپاس دەکات، ئەگەر تووشی بە تووشی بەڵایەکەوە بوو ئارام دەگرێت، ئەگەر تووڕە کرا ڕقی قوت دەداتەوە، ئەگەر دەسەڵاتی هەبوو چاوپۆشی دەکات، ئەگەر خراپەی کرد داوای لێخۆشبوون لە خودا دەکات، ئەگەر بەڵێنی دا جێبەجێی دەکات.[1]

(معاويه)ی ئەمیری ئیمانداران (خودا لێی ڕازی بێت) لەم هەواڵەیدا ژمارەیەك مرواری لە پەندو ئامۆژگاری کۆکردنەوە، کە ئەمانەن: سوپاسگوزاری لە کاتی فەرحانی‌و هەرزانیدا، ئارامگرتن لە کاتی تاقیکردنەوەکاندا، جڵەوگیری نەفس لە کاتی تووڕەبووندا، لێبوردن لە کاتی دەسەڵاتدا، بەڵێن بردنەسەر، (أستغفر الله) کردن لەسەر گوناهو تاوانی ئەنجامدراو، لەم هەواڵەدا بە کورتی شەش بابەتی گرنگی هێناون، کە هەر یەکێکیان ژمارەیەك لاپەڕەی لەسەر پڕدەکرێتەوەو دەنووسرێن، بێگومان ئەمە لە (جوامع الكلم) دەژمێردرێت، کە لە بەرزترین جۆری ڕەوانبێژی دادەنرێت، چونکە لە چەند وشەیەکی کەمدا ژمارەیەك واتای زۆروزەوەند دەخاتەڕوو، پێغەمبەری خودا (ﷺ) زانستی (جوامع الكلم)ی پێ بەخشرابوو، ژمارەیەك لە هاوەڵان (کە (معاويه) یەکێك بووە لەوان) لەبەر دەستی پێغەمبەر (ﷺ)دا پەروەردە بوون‌و لەم بوارەدا ناوبانگیان دەرکرد.[2]

٣ـ زیرەکی‌و فێڵزانی:

صیفەتی زیرەکی‌و فێڵزانی یەکێکی تر بوو لەو صیفەتانەی (معاويه)ی پێ لە خەڵك جودا دەکرایەوە، سەبارەت بە زیرەکی‌و ڕێکوپێك بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەتەکەی‌و مشورلێخواردنی گێڕدراوەتەوە: موسڵمانەکان لە سەردەمی ئەودا چوونە (غەزا)و تاقمێکیان لێ دیل کرا، برانە قوستەنتینیەو لەبەردەم مەلیکی (ڕۆم) ڕاگیران، یەکێك لە دیلە موسڵمانەکان قسەی کرد، یەکێك لەو (بطريق)[3] انەی لەبەر دەستی مەلیك وەستابوون لێی هاتە پێشەوەو زللەیەکی لە ڕوومەتی دا،ئەم پیاوە (کە قورەیشی بوو) هاواری کردو وتی: ئای بۆ ئیسلام! ئەوە لە کوێی معاویە، ئەوە بۆ پشتگوێت خستین‌و بەزایەتداین‌و دوژمنت لە خوێن‌و شەرەفمان بەردا.

---

١ أنساب الأشراف (٥/٣٢٦).

٢ التاريخ الاسلامي (١٩/٣٥٥، ٢٠).

٣ (بطريق) سەرۆکی (ئوسقوف)ەکانە، (ئوسقوف)یش پیاوی کەنیسەیە.

ئـەم هەواڵـە دزەی کـردو بـە (معاویـە) گەیـشتەوە، زۆری ئـازارداو وازی لـە خـواردنو خواردنەوەی بە تام هێناو خۆی تاك کردەوەو هەواڵەکەی بە کـەس نـەوت، ئـەمجا فێڵـەکانی خۆی لـە پێنـاوی کڕینـەوەو گۆڕینـەوەی دیلـەکانی نێـوان موسـڵمانانو ڕۆم خستنەگەڕ، تـا سەرە گەیشتە سەر کڕینەوەی ئەو پیاوە قورەیشیەو هاوەڵـەکانی، کاتێك کـابرا گەیـشتەوە وڵاتی ئیسلام، (معاویە) بانگی کـردو چاکەی زۆری لەگـەڵ ئـەنجام داو ئـەمجا پێـی وت: نـە پـشتگوێمان خـستووی نـە بـە زایـەمان داوی، نـە خـوێنو شـەرەفـو ناموسیـشمان حـەڵاڵ کردووی.

(معاویە) لەم کاتەدا مێشکی بە سازکردنی فێڵێکەوە خـەریك دەبێـت، بـە دوای کەسـێکی سەر کەنارە ئاوی شاری (صور)ی دیمەشقدا دەنێرێت، ئـەم پیـاوە کابرایـەکی کەللـە وشـکی بەهێزو شارەزا بە جەنگی دەریا دەبێت، (معاویە) دەیباتە لای خۆیو بە تەنها قسەی لەگەڵ دەکـاتو پێـی دەڵێـت کـە ئـەو کـاری ئەنجامـدانی فێڵێکـی لـەو شـێوەی کـە نەخـشەی بـۆ دەکێشێت پێ دەسپێرێتو، دەشیەوێت بـە وریـاییو لەسـەرخۆیی بـۆی تـەواو بکـات، ئیـدی ڕێکـەوتن لەسـەر ئەوەسـامانێکی زۆری بــە مەبەسـتی کڕینـی کەلوپـەلی تـازە بابـەتو ڕەنگاوڕەنگو بۆنی خۆشو زێڕو جەواهێر پێ بدات، بەلەمێکی وای بـۆ بـە دروسـتکردندا کـە هێندە تیژڕەو بێت هـیچ بەلـەمێکی تـری پـێ نەگاتـەوە، کـابرا بەڕێکـەوتو گەیـشتە شـاری (قـوبرۆص)، پەیوەنـدی بـە سـەرۆکی شـارەوە کـردو هـەواڵی دایـە کـە هەنـدێك پێداویـستی مەلیکی هـەڵگرتووەو دەیهـەوێت بـە مەبەسـتی بازرگـانیو بینینـی مـەلیكو کەسـە تایبـەتو نزیکـەکانی بـەرەو (قوسـتەنتینیە) بـچێت، مـەلیك سـەبارەت بـەم بازرگانـە خەبـەردار کـرا،[1] ئەویش ڕێگای پێدا، کابرا خۆی گەیاندە کەنداوی (قوستەنتینیە)، بە دیاری بە نرخەوە خۆی گەیاندە (مەلیك)و (بطریق)ەکانی، کڕینو فرۆشتنی لەگەڵ کـردنو خـۆی لـە هـەمووان نزیـك کردەوە، جگە لەو (بطریق)ەی زللەی لـە قورەیـشیەکە دابـوو، هـیچ شـتێکی نەدایـە، ئەمـەو کابرای (صوری) بەو شێوەیەی (معاویە) نەخشەی بۆ کێشابوو هەڵسوکەوتی دەکرد، ئیـدی بـەرەو شـام گەڕایـەوە، زۆربـەی (بطریـق)ەکـان پێیـان وتبـوو کـە دەبێـت ئـەو جـۆرە کەلوپەلانەیان بۆ بێنێت کە خۆیان بۆیان وەصف کردوون، کە گەیشتە شام، بە نهێنی خـۆی گەیاندە (معاویە)و چی بینیبووو ڕوویدابوو بۆی گێڕایەوە، چ شتێکیان داوا لێکردبوو حەزیان چووبووەسەر ،معاویە فەرمانیدا بۆیان بکڕن، جا (معاویە) لێی نزیك بـۆوەو پێـی وت: ئەگـەر

---

١ الشهب اللامعة (ص: ٤٨٧).

ئەمجارە گەڕاینەوە (بطریق) (ی زللە وەشێن) لەسەر ئەوەی هیچت نەداوەتیی‌و پشتت پێ نەبەستبوو گلەییت لێدەکات، جا داوای لێبوردنی لیّ بکەو بە قسەی تەڕو شیرین‌و دیاری نایاب هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەو بیکە بە سەرکاری خۆت‌و کارو کەسابەتیەکەت، بەمە زیاتر لێیان نزیك دەبیتەوە، جا ئەگەر بە تەواوەتی ئەو ئەرك‌و کارانەی پێم سپاردبووی بە ڕێکوپێکی ئەنجامت دان‌و زانیت (بطریق)ەکە چ مەبەستێکی هەیەو داوای چت لیّ دەکات بۆی بکڕی، ئەوا خێرا بگەڕێوە تا فێڵەکە بە حیسابی خۆی بێت‌و بڕوات، کاتێك کابرای (صوری) بە هەموو ئەو کاڵاو شمەکانەی داوای لێکرابوون‌و کەلوپەلێکی زۆری تریش گەڕایەوە (قوستەنتینیە)، هێندەی تر پلەوپایەی بە لای (مەلیك)و (بطریق)ەکان‌و تەواوی دەست‌و پێوەندەکانیەوە بەرز بۆوەو بە لایانەوە خۆشەویستتر بوو، ڕۆژێکیان دەیەویست سەردانی (مەلیك) بکات، کە دەگاتە کۆشك، (بطریق)ی زللە وەشێن ڕێی لیّ دەگرێت و پێی دەڵێت: چ گوناهێکم بەرانبەر تۆ کردووە؟ بۆ ڕوو دەدەیتە خەڵك‌و پێویستیەکانیان بۆ جێبەجیّ دەکەی‌و ڕوو لە من وەردەگێڕی؟، کابرای (صوری) وتی: خەڵکانێکی زۆرتر لەوانەی باسیان دەکەی ڕوویان لێناوم‌و داوایان لێکردووم، منیش پیاوێکی غەریبم، لە ترسی دیلە موسڵمانەکان‌و سیخوڕەکانیان نەبادا خەبەرم لیّ بدەن‌و لە لای کاربەدەستانی وڵاتی ئیسلام بۆم تیّ بچێنن کە هاموشۆی ئەو وڵاتە دەکەم دەمەوێت شێوەی خۆم بگۆڕم‌و خۆم نەناس بکەم، ئێستا کە زانیم حەزت لێیە پەیوەندیم لەگەڵ ببەستی، منیش پێم چاکە، بەڵام حەز ناکەم جگە لە تۆ کەس لە کاروبارم بزانیّ، تۆ سەرپەرشتی کاروبارەکانم‌و پەیوەندیەکانی نێوان من‌و (مەلیك) بکە، جا فەرمان بدە: چ ئیشێکت لە وڵاتی ئیسلام هەیەو چ پێداویستیەکت هەیە بیڵیّ تا بۆت جێبەجیّ بکەم، لەم کەینوبەینەدا دیاریەکی بە نرخ‌و نایابی (کە لە شوشەی نەخشێنراوو بۆن‌و جەواهێرو کاڵاو پۆشاکی تازە بابەت پێکهاتبوو) پێشکەش کرد، ئیتر بەردەوام ئەم هاموشۆیەی نێوان (ڕۆم‌و معاویە)و (معاویەو ڕۆم)دا ئەنجام دەداو (مەلیك)و (بطریق)ەکان داواکاریەکانیان دەخستە ڕووو ئەویش بۆی جێبەجیّ دەکردن، ماوەی چەند ساڵێك تێپەڕی، جارێکیان کابرای (صوری) لەسەر گەڕانەوە بوو، (بطریق)ەکە، پێی دەڵێت: پێداویستیەکم هەیە، دەمەوێت ئەو چاکەم لەگەڵ بکەیت‌و بۆم جێبەجیّ بکەیت، فەرشێکی (سۆسنجر)م بە دۆشەك‌و باڵنجەکانیەوە بۆ بکڕە، با بە ڕەنگی هەمەچەشنەی سوورو سەوزو تەواوی ڕەنگەکانی تر نەخشێنرابێت‌و مواصەفاتی لەم جۆرە بێت، نرخی هەرچەندێك بێت کێشە نیە، ئەویش بەڵێنی پێداو بۆی سازکرد، بابای بازرگانی (صوری) عادەتەن کە دەهاتە (قوستەنتینیە) بەلەمەکەی لە نزیك خانوبەرەی ئەو (بطریق)ە

لەنگەری دەگرت، بابای (بطریق) کێڵگەیەکی ونو نابەرچاوی بە دووری چەند میلێك لە قەراغ کەنداوی قوستەنتینیە لەسەر قەراغ دەریا هەبووو کۆشکێکی دامەزراوو سەیرانگایەکی ڕازاوەی تێدا دروستکردبوو، زۆرینەی کاتەکانی خۆی لەوێ بەسەردەبرد، بابای (صوری) بە نهێنی چووە لای (معاویە)و بارودۆخەکەی بۆ باسکرد، (معاویە)ش یەکسەر فەرشێکی ڕەنگاوڕەنگی بە باڵنجو دۆشەکیەوە بۆ ئامادەکردو پێشی ڕاگەیاند کە چۆن فێڵەکە ڕادەپەڕێنێتو دەرەنجام چۆن (بطریق) بە تەڵەوە دەکات، ئەمجا بە ڕایەخەکەو هەموو ئەو شمەکانەی (بطریق) داوای کردبوون خاکی ئیسلامی بەجێ هێشتو بەرەو (قوستەنتینیە) بەڕێکەوتەوە.

شیاوی باسە بابای بازرگانی (صور)ی لەم ماوەیەدا وەکو ئەندامێکی ڕۆمی، بەڵکو ئەندامێکی نێو کۆشکی مەلیکی لێهاتبووو زۆری هۆگر ببوون، دیارە بەهۆی ئەم تەماعو شتە ڕەنگاوڕەنگانەی پیشانی دەدانو پێی دەدان، ڕۆمەکانیش ئاشقی ئەم شتە زرقو برقانە بوون، کاتێك لەڕێی دەریاوە بەرەو کەنداوی (قوستەنتینیە) بەڕێکەوتو خەریك بوو بە پشوەبای شەماڵ لە کێڵگەی (بطریق) نزیك بێتەوە، کابرای (صوری) هەواڵی (بطریق)ەکەی لە بەلەمەوانو کەشتیرانەکان پرسی، هەواڵیاندا کە ئێستا لە کێڵگەکەیەتی، درێژایی کەنداوی (قوستەنتینیە) نزیکەی (٣٥٠) میلە، کێڵگەو کۆشکەکان لەسەر قەراغەکانی هەڵکەوتوون، بەلەمو کەشتیەکانیش جیاوازن، هەریەکەی بە جۆرە کاڵاو خۆراکێکەوە بەرەو قەراغی ئەو کۆشکانە بەڕێدەکەوتن کە لەبەر زۆریان نەدەژمێردران، هەر کە بابای (صور)ی زانی (بطریق) لە کێڵگەکەیەتی ڕایەخە ڕەنگینەکەی لەنێوەڕاستی کەشتیەکەیدا ڕاخستو باڵنجو دۆشەکەکانی لەسەر ڕیزکردنو بۆ خۆی پاڵیدایەوە لەسەری، پیاوە کەشتیرانەکانی لە ژێر ڕایەخەکەوە ڕیزکردنو دەستیان لە سەڵبەکانیان گیرکردو بەقیتی ڕا وەستان، کەس نەیدەزانی کەس لەنێو کەشتیەکەدایە مەگەر کەسێکیان بە ئیشێکەوە بهاتبایە دەرەوە، با بە خێرایی کەشتیەکەی بەرەو ڕووی کێڵگەکە دەبرد، لە خێراییان دەتوت تیرەو لە کەوان دەردەچێت، ئەگەر کەسێك لەنێو کەشتیەکەدا بووایە نەیدەتوانی لەبەر توندی با چاو هەڵێنێت، کەشتی کۆشکی (بطریق)ی لێ وەدەرکەوت، (بطریق) لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەی لەسەر گوێسەبانەی لایەکی کۆشك دانیشتبووو مەی بەسەردا دەکردو خۆشیو شادی کەللەی پڕ کردبوو، کاتێك بەلەمی کابرای (صوری) بەو جۆرە بینی واقی وڕماو لە خۆشیان هاواری کردو قیڕاندی، لە کۆشکەکەی دابەزیو هاتە سەر کەنارو ڕایەخە ڕەنگینەکەو باڵنجو دۆشەکەکانی کە دەتگوت باخچەی پڕ گوڵو گوڵزارە سەرنجی بە لای خۆیدا ڕاکێشابوو،

خۆی پێ ڕانەوەستاو بەر لەوەی بابای (صوری) لە کەشتیەکە دابەزێت، هاتە نێو کەشتیەکەوە، کاتێك پێیەکانی بە تەواوەتی لەنێویدا جێگیر بوون کابرای (صوری) پشتەپێیەکی لە ڕایەخەکە ڕاکێشا، (ئەمە نهێنیەك بوو لە نێوان خۆی‌و پیاوانی ژێر ڕایەخەکەوە)، ئەوان کە دەستیان لە سەڵبەکانی کەشتیەکە گیرکردبوو، بە پەلەو بێ ڕاوەستان دەستیان بە سەڵبەلێدان کردو کەشتیان فڕاند، (بطریق) هەر ئەوەندەی زانی لە نێوەڕاستی کەنداوە، هەرچەندە هاواری کرد بەڵام بایی پولێك بوو، هێشتا شەو دانەهاتبوو لە کەنداوو نێوەڕاستی دەریا تێپەڕی، (بطریق)ی بە گوریسێك لولپێچ کردو بەستەوە، با لە بەختی ئەو هەڵی کرد، بەو شەوە تاریكو ئەنگوستە چاوە بە دڵو دەروونی شادەوە سەر بەرەو خوار بەسەر شەپۆلەکاندا تێدەپەڕی، لە ڕۆژی حەوتەمدا کەشتی لە کەناری شام لەنگەری گرت، ئیدی (بطریق) بە دیلکراوی‌و لە ڕۆژی سێزدەهەمدا هێنرایە بەر دەستی (معاویە)، کە بینی گەشایەوە،[١] وتی: خێرا پیاوە قورەیشیەکەم بۆ لا بێنن، هێنایان‌و خەڵکێکی زۆر لە پیاوە تایبەتەکان ئامادەی دانیشتنەکە بوون، هەر کەسە لە جێی خۆی دانیشت‌و تەماشای دەکرد داخوا چ ڕوودەدات.

(معاویە) بە بابای (قورەیشی) وت: هەستەو هەر لەسەر ئەم ڕایەخە مەزنەی (ڕۆم) تۆڵەی خۆت لەو (بطریق)ە بسێتێنەوە کە زللەی لە ڕومەتت داوە، چونکە ئێمە نە بە زایەمان داوی‌و نە خوێن‌و ناموسیشمان حەڵاڵ کردووی، چۆنی لێداوی ئاوا لێی بدەوە، نە کەمتر نە زیاتر، چاوت لەوەبێت کە خودا لە تۆڵەسەندنەوەدا چی لەسەر واجب کردووی، کابرای قورەیشی چەند زللەیەکی لێداو پاڵێکی بە ملیەوە نا، ئەمجا بەرەو لای معاویە چووو کەوتە ماچکردنی دەست‌و ئەوملاو ئەولای‌و وتی: هەر کەسێك تۆ بکاتە سەروەری خۆی زایە نابێت، هەر کەسێك تۆ بکاتە سەرۆکی خۆی ڕەنجەڕۆ نابێت، تۆ مەلیکی زاڵ‌و سەرکەوتووی‌و قەت ناشکێی، سنوورەکانت دەپارێزیت‌و پاسەوانی ڕەعێت دەکەی ئیدی هەر وەصفی کردو بۆی پاڕایەوە، ئەمجا (معاویە) –کە دڵی ئاوی خواردەوەو ویژدانی حەسایەوە– میواندارییەکی باشی بابای (بطریق)ی کردو پۆشتەی کردو چاکەی زۆری لە بەرانبەردا نواند، ئیتر ڕایەخە نەخشاوەکەی‌و کەلوپەلێکی زۆری بۆ پێچایەوەو ژمارەیەك دیاری بە نرخیشی بۆ (مەلیك) سازکردن‌و بەرەو (قوستەنتینیە)ی بەڕێکردەوەو پێی وت: بگەڕێوە بۆ لای مەلیکەکەت‌و

١ الشهب اللامعة في السياسة النافعة (ص: ٤٩٠).

پێی بڵێ: لە لای مەلیكی موسڵمانان بووم،[١] لەسەر ڕایەخەكەی تۆ سزای تاوانبارانی دەداو لەنێو جەرگەی مەملەكەتە باڵادەستەكەتدا تۆڵەی ڕەعیەتەكەی دەستێنێتەوە.

بە بابای (صوری)یشی وت: لەگەڵی بڕۆ تا دەیگەیەنیتەوە كەنداو، (بطریق)و دەستو پێوەندەكانی گەڵی -ئەوانەی كە بە هەڵەداوان خۆیان هەڵدابووە نێو كەشتیەكەوە- لەوێ دابەزێنە، جا بەوپەڕی ڕێزەوەو بە سواری بەرەو (صور)یان بەڕێكردن، هەر هەموویان سواری كەشتیەكە بوون، پشوەبایەكی خۆش هەڵی كردو كەشتی بەڕێكەوت، لە ڕۆژی یازدەهەمدا گەیشتنە سنووری (ڕۆم)و لە كەنداو نزیك بوونەوە، كە تەماشای كرد قەراغ كەنداو بە زنجیرو شوورە سنووردار كراوە، (بطریق)و نۆكەرەكانی بە كەلو پەلەكانیانەوەو دیاری مەلیكەكانیانەوە دابەزێنران، یەكسەر (بطریق)یان بەرەو لای (مەلیك) بردو، ڕۆمەكان بە هاتنەوەیو ڕزگاربوونی لە بەند موژدانەیان بە یەكتر دەداو پیرۆزباییان لە (بطریق) دەكرد، ئیتر (مەلیكی ڕۆم) لە بەرانبەر ئازادكردنی (بطریق)و ئەو دیاریە بە نرخانەی بۆی ناردبوون، چاكەی (معاویە)ی لەبەر چاوی خۆی دا دەناو لە ڕۆژگاری ئەودا یەك گیراوو دیلی موسڵمان ستەمی دەرهەق ئەنجام نەدرا، (مەلیك) وتی: ئەو(واتە معاویە) زاناو زیرەكترین كەسی عەرەبەو فێڵزانترین مەلیكە، هەر لەبەر ئەمەیە عەرەب كردوویانە بە پێشەنگی خۆیانو هەڵسوڕێنەری كاروبارەكانیان، ئەگەر بیەوێت من بخاتە تەڵەوە، ئەوا دەتوانێت فێڵێكی لەو جۆرە بكات.[٢]

ئەم سەرگوزەشتە بەڵگەیە لەسەر زیرەكیو زرنگیو بە ئاگایی (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت)و دەری دەخات كە چ سیاسەتێكی باشی پەیرەو كردووەو، چۆن بایەخی تەواوی بە كاروباری ڕەعیەتەكەی داوەو هەتا ئەوەی پارێزگاری لە مافی تاكەكانی ڕەعیەتەكەی كردووەو نەیهێشتووە ڕێزو حورمەتیان لەكەدار بكرێت.[٣]

### ٤ـ ئاوەزی ئاوازەیو توانای كەمەندكێشكردنی خەڵك بە لای خۆیدا:

(معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) بە ئەقڵێكی تاقانە لە خەڵكانی تر جیادەكرایەوە، لە كەمەندكێشكردنی خەڵك بە لای خۆیدا دەستێكی باڵاو توانایەكی سەركەوتووی هەبوو، تووشی بە تووشی هەر ڕووداوێك یان تەنگژەیەك ببوایە سودی لێ وەردەگرتو دەیزانی چۆن

---

١ وشەكە لە بنەڕەتدا (عەرەب)ە.

٢ الشهب اللامعة في السياسة النافعة (ص: ٤٩١).

٣ المصدر نفسه (ص: ٤٩١)، تعليق محقق الكتاب السيد سليمان معتوق الرفاعي (رحمه الله).

خۆی لێ بپارێزێت‌و بە چ ڕێیەکدا خۆی لێ دەرباز بکات، بە هۆی هەڵگرتنی باری حوکمڕانی لە ماوەی چل ساڵی تەواوداو لەو کاتەوە (عومەر) (خودا لێی ڕازی بێت) کردبووی بە والی‌و ــ بیست ساڵ بە والیایەتی‌و بیست ساڵی تر بە خەلیفایەتی ــ بەڵێ لەم ماوە درێژخایەنەدا شارەزاییەکی بەرفراوان‌و ئەزموونێکی گەورەی وەرگرت،[١] لەم ماوەیەدا ئاڵوگۆڕی چەندین پۆستی سەربازی‌و ئیدارەی مەدەنی کردووەو دەرەنجام شارەزاییەکی باشی لە سیاسەت‌و بەڕێوەبردنی وڵاتدا بەدەستهێناوە، ئەو سوودی لە هەموو ئەو بارودۆخ‌و گۆڕانکاریانە دەبینی کە بەسەریدا ڕادەبووریین، تا ئەوەی ماوەی بیست ساڵی تەواوو بەبێ هەبوون یان دەرکەوتنی هیچ ڕکەبەرێك توانی کاروباری دەوڵەتی ئیسلام بە ڕێکوپێکی‌و بێ کێشە بەڕێوەبەرێت.[٢]

شێخ (خضري) دەڵێت: بەڵام سەبارەت بە خودی (معاویە) کەسێك نەبوو بە ئەندازەی ئەو لە سیاسەتدا باڵادەست بێت، لەگەڵ هەموو سەرانی عەرەبدا سازا، سنووری ئاوەزو ئەرمونیانیەکەی نەدەزانرا، هیچ تیرەیەك شانی لە شانی ئەو تیرە نەدەدا کە ئەوی تێدا ئەندام بوو، گەیشتبووە لوتکەیەکی هێند بەرزو عاسێ، کە خەڵکانی تر لەوێ چاویان ڕەشکەوپێشکەیان دەکردو لێی خلۆر دەبوونەوە.[٣]

وەکو زانراوە سیاسەتی سەرکەوتوو بەندە بە ئارامی‌و خۆڕاگری لە کاتی تووڕەبووونداو بە ئاسایی وەرگرتنی ناڕەحەتیەکان تا ئەو کاتەی نامێنن، (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) لەم بوارەدا پشکێکی باش‌و بەرفرەی هەبوو، ئەو لەگەڵ تێکڕای خەڵك‌و خەڵکی تایبەت‌و پاشاو گەدادا ئەمە ڕێبازی بوو، ئەمە نموونەیەکی سیاسەتی ئەوە سەبارەت بە مامەڵەکردنی لەگەڵ خەڵکدا:

**أـ میسوەری کوڕی مەخڕەمە (خودا لێی ڕازی بێت)و ڕەخنەگرتنی لە (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت):**

لە (عوروەی کوڕی زوبێر)ەوە، (میسوەری کوڕی مەخڕەمە) هەواڵی پێدا، کە سەردانی (معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان)ی کردو پێویستیەکانی بۆ جێبەجێ کردن، ئەمجا بانگی کردو بە تەنها قسەی لەگەڵ کردو وتی: مەسەلە چیە ڕەخنە لە ئیمامانی خۆت دەگری‌و تانەو

١ الطبقات الکبری (٤٠٦/٧).
٢ الامویون بین المشرق والمغرب (٨٢/١).
٣ الدولة الأمویة للخضیري (ص: ٣٧٧).

تەشەریان لێ دەدەی؟ (میسوەر) وتی: لەو لایەوە وازمان لێ بێنەو بۆچی هاتووین بە ڕێکوپێکی بۆمان جێبەجێ بکە، (معاویە) وتی: نە بە خوا دەبێ بە خودی خۆت قسەم لە ڕوودا بکەیو ڕەخنەم لێ بگریو نەنگیەکانم بۆ باس بکەی، (میسوەر) وتی: چ ڕەخنەیەکم لەسەری هەبوو بەبێ پەراندن هەمووم پێ وتنو بە دوورو درێژی بۆم خستنەڕوو بەردەمی، (معاویە) وتی: کەس بێ گوناهو بەری نیە، باشە ئەی (میسوەر) ناکرێت ئەو کارە چاکسازیانەشم بۆ بژمێری کە لە بەڕێوەبردنی کاروباری گشتی موسڵمانناندا ئەنجامم داون، نازانی هەر چاکەیەك دە بەرانبەرە؟ یان هەر گوناهەکان دەژمێریو لە چاکەکان دەگەڕێی! (میسوەر) وتی: نە بە خوا جگە لەو گوناهانەی خستمنەڕوو هیچی تر باس ناکەین، (معاویە) وتی: جا ئێمە دان بە هەموو ئەو گوناهانە دێنین کە کردوومانن، باشە ئەی (میسوەر) تۆ هیچ گوناهێکی وا مەترسیدارت دەربارەی کەسوکاری نزیكو ژێردەستی خۆت ئەنجام نەداوە؟ کە ئەگەر خودا لێت خۆش نەبێت بە هۆیەوە پێی لەنێو بچی؟ (میسوەر) وتی: بەڵێ! (معاویە) وتی: ئەی چ شتێك ناهێڵێت دەربارەی لێخۆشبوونی من ئومێدەوار بی؟ سوێند بە خودا ئەوەندەی من خۆم لە چاکسازیو کاری باشە نزیك دەکەمەوە تۆ هێندە خۆتی لێ نزیك ناکەیتەوە، بەڵام وەڵڵاهی لە نێوان خوداو غەیری خودادا تەنها خودا هەڵدەبژێرم، تەنها ئەو شتە پەسەند دەکەم کە خودا پێی خۆشە، من لەسەر دینێکم خودا کردەوەی تێدا قبوڵ دەکات، پاداشتی کردارە چاکەکانی تێدا دەدرێتەوە، سزای هەموو کردەوە خراپەکانی تێدا دەدرێت مەگەر خودا بیەوێت لە کەسێك ببورێت، من وا دادەنێم پاداشتی چەند قاتم لەسەر ئەو کردەوە چاکانەم بدرێتەوە کە ئەنجامم داون، من لە بەرانبەر کرداری هێند گەورەی خۆم وەستاوم کە بۆ خاتری خودا ئەنجامم داون نە بە من دەژمێردرێنو نە بە تۆش دێنە ژماردن، ڕاپەڕاندنی جومعەو جەماعەتی موسڵمانانو پێشەنگایەتی کردنو بەڕێخستنی پۆلی جیهادکەرانو حوکمگێڕان بە قورئانو کردارگەلێکی وا کە هەتا بۆت بژمێرم پێت حیساب ناکرێن، (میسوەر) وتی: هەر کە (معاویە) ئەو قسانەی کردن بۆم دەرکەوت کە قسەی پێ بریمو بۆم نیە هیچی تر بڵێم. (عوروە) وتی: دوابەدوای ئەم (وتووێژ)ە، لە هەر شوێنێکدا باسی (معاویە) کرابێتو (میسوەر)یش لەوێ بووبێت، نەبیستراوە جگە لە نزای لێخۆشبوون هیچی تری دەربارە وتبێت.[١]

---

١ تاريخ بغداد (٢٠٩/٢٠/١)، سير أعلام النبلاء (١٥١/٣).

ئـەم بەسـەرهاتە نموونەیـەکی بـەرزە بـۆ هونـەری قەناعـەت پێکـردنو هەوڵـدان بـۆ دامرکاندنەوەی بڵێسەی تووڕەیی نەیارانو گۆڕینی بیروڕایان، (معاویە)ی ئەمیری ئیمانداران (خودا لێی ڕازی بێت) توانی قەناعەت بە (میسوری کوڕی مەخرەمە) (خـودا لێـی ڕازی بێـت) بینێتو ئەو سیاسەتەی پێ قبوڵ بکات کـە ئـەو پـەیڕەوی لێ دەکـات، پێـشدا کـە ڕەخنـەی لێدەگرتو هێرشی دەکردە سەر، بەڵام لەمەولا ستایشی دەکردو هەمیشە دوعای بەخێری بۆ دەکرد ، سودێکی تری ئەم بەسەرهاتە ئەو لاکردنەوە پەروەردەییەی (معاویە)یە: کە دەبێت بە چاوی دادپەروەرانـە حـوکم بەسـەر موسـڵماندا بـدرێتو لەگـەڵ ئـەوەدا تەماشـای تـاوانو گوناهەکانی دەکرێـتو حیـسابیان لەسـەر دەکرێـت، ئـەوا دەبـێ تەماشای کـردەوە چـاکو پاکەکانیشی بکرێتو حیسابیان بۆ بکرێتو ئەمجا بخرێتە تەرازووی ڕەخنەوە، لەوانەیـە ئـەو موسـڵمانەی بـەر تانـەو تـوانجو ڕەخنـە دەدرێـت، کـرداری هێنـد گـەورەو چـاکی هـەبن کـە گوناهەکانی لە پەنایاندا شایانی باسکردنیش نەبن.[1]

ب ـ (ثابتی کوڕی قەیسی خەطیمی ئەنصاری) (خودا لێی ڕازی بێت):

(ثابتی کوڕی قەیسی خەطیمی) پیاوێکی نەفس بەرز بووو بە خۆشویستنی (عـەلی کـوڕی ئەبو تالیب) مەست ببوو، (عەلی) لە سەردەمی خۆیدا کردبووی بە کاربەڕێوەبەری (مەدائین)، هەتا ئەو کاتـەی (مـوغیرەی کـوڕی شـوعبە) هاتـە کوفـە ئـەو هـەر لەسـەر کارەکـەی خـۆی بەردەوام بوو، هەرچی (معاویە)شـە خـۆی لـە شـوێنەکەی ئـەو (واتـە مـەدائین) دەپاراسـت، (ثـابتی کـوڕی قـەیس) بـەرەو مـاڵی خـۆی گەڕایـەوە، تەماشـای کـرد کۆمـەڵی پـشتیوانان (ئەنصار) لە مزگەوتی (بني ظفر) کۆبوونەوەو دەیانەوێت نامەیـەك بـۆ (معاویـە) بنێـرن (کـە تازە کراوە بە خەلیفە)و داوای مافی خۆیانی لێ بکەن، (ثابت) وتی: ئـەوە چـیە؟ وتیـان: بـە نیازین نامە بۆ (معاویە) بنووسین، وتی: جا بۆ بە جەماعەت بۆی دەنووسن؟! با یـەك کـەس لە ئێمە بۆی بنووسێت، ئەگەر نیازی بەرانبەر کەسێکمان خراپ بێتو خراپەی بەسەر بێنێـت لەوە باشترە ناوی هەموانتانی بچێتە بەردەستو پاشان خراپەتان بەسەر بێنێت، وتیان: جـا کێ خۆی دەکاتە قوربانی؟ وتی: من، وتیان: دە خەریك بە، جا بـە نـاوی خۆیـەوە نامەکـەی ئاراستە کردو چەند شتێکی باس کـرد، لـە نێوانیانـدا: سەرخـستنی پێغەمبـەر (ﷺ)و چـەند شـتێکی تـریش، هـەروەها نووسـیبووی: مافـەکانی ئێمـەت ڕاگرتـوون، دەسـت درێـژیت کردووینەتە سەرو ستەمت لێ کردووین، چ گوناهێکمـان دەرهـەق بـە تـۆ نـەکردووە جگـە لـە

---

١ التاريخ الاسلامي (١٧/١٨، ٥٣٩).

پشتیوانیکردنمان لە پێغەمبەر (ﷺ)، کاتێك نامەکەی گەیشت، دایە (یەزید)و خوێندیەوە، (معاویە) بە (یەزید)ی وت: ڕات چیە؟ وتی: چەند کەسێکی بۆ دەنێریو بە دەرگای ماڵەکەی خۆیدا هەڵی دەواسی، ئەمجا گەورە پیاوانی (شام)ی بانگ کردنو ڕاوێژی پێکردن، وتیان: بە دوایدا دەنێریو لە بەرانبەر دۆستانی خۆتو پیاو ماقوڵانی نێو هۆزەکاندا ڕای دەگریو ئەمجا لە داری دەدەی، وتی: جگە لەم ڕایە ڕایەکی ترتان نیە؟ وتیان: نەخێر، ئەمجا (معاویە) نامەی بۆ نووسی: لە نامەکەت ئەوەی سەبارەت بە پێغەمبەر (ﷺ) نوسیبووت تێگەیشتم، بۆ خۆت چاك دەزانی کە من چەند بەو فیتنەو ئاژاوە سەرقاڵم کە تۆش دەنگت تێدا هەڵێناوە، جا سێ ڕۆژم مۆڵەت بدە، (ثابت) نامەکەی پێگەیشتو بۆ خزمەکانی خۆی (واتە پشتیوانان)ی خوێندەوە، ئیتر لە بەیانیەکەی ڕۆژی چوارەمدا بەخششو سەروەتو سامانەکەیان پێگەیشت.[1]

لەم هەواڵەدا: دەبینین کە (معاویە)ی ئەمیری ئیمانداران (خودا لێی ڕازی بێت) هەڵوێستێکی گەورەی سیاسیانەو حەکیمانەی نواندووە، ئەو پاش ئەوەی ڕاوێژی بە (یەزید)ی کوڕیو پیاو ماقوڵانی شام کردن، هیچ بە ڕایەکەیان سەرسام نەبوو، لەو خاڵەدا کە دەبێت خەڵك بە ڕەفتاری توندو تیژو تۆبزی بگیرێنو گەردنکەچ بکرێن یەکی نەگرت لەگەڵیانو بە توندی وەڵامی نامە توندەکەی (ثاتبی کوڕی قەیس)ی نەدایەوە، بەڵکو بە پەلە بارگەی پێچایەوەو بە قەتارێك بەخششو دیاری وەڵامی کۆمەڵی (ئەنصار)ی دایەوە، ئەو بەم سیاسەتە سەرڕاستەیو ئەم هەڵوێستە حەکیمانەی هیچ زیانی پێ نەگەیشت، بەڵکو قازانجی کردو ڕەزامەندی (پشتیوانان)و خەڵکانی تریشو هەموو ئەوانەشی بۆ خۆی مسۆگەر کرد کە ئەم هەواڵەیان پێگەیشت،خۆ ئەگەر ئەو بە ڕای خەڵکی سادەو توندڕەو ڕەفتاری کردبایەو زەبری لە نوسەری لە نامەکە دابایە، ئەوا کۆمەڵی (پشتیوانان) شۆڕشیان لێ دەکردو لەبەر ناوبانگو جێگەو پێگەی بەرزیان لە ئیسلامدا زۆرێك لە هۆزو تایەفەکان پشتیوانیان لێ دەکردن.[2]

### ج ـ (ئەحنەفی کوڕی قەیس) (خودا لێی ڕازی بێت):

(إبن خلكان) دەڵێت: عبیداللە ـ واتە (إبن زیاد)یوالی عێراق ــ پیاوە دیارەکانی عێراقی کۆکردنەوەو بە مەبەستی سەلامونەعروف لەگەڵ (معاویە)ی خەلیفە بەرەو (شام)ی بردن،

---

١ تاریخ بغداد (١/١٧٦).

٢ التاریخ الاسلامي (١٧/٥٣٧).

(ئەحنەفی کوڕی قەیس) یەکێك بوو لەو پیاوانە، کاتێك گەیشتن، (عبیداللە) چووە لای (معاویە) هەواڵی هاتنی سەرانی عێراقی پێ ڕاگەیاند، وتی: بەپێی پلەو پایەیان بە لای خۆتەوە یەك یەك بیانهێنە ژوورەوە، چووە دەرەوەو (معاویە) چۆنی پێ وتبوو بەڕیز هێنانیە ژوورەوە، (ئەحنەفی کوڕی قەیس) دواهەمین کەس بوو، کاتێك (معاویە) چاوی پێکەوت ـ بە هۆی ئەوەی کە دەیناسی و دەیزانی چ پیاوێکی پایەدارو سەردارە بۆیە زیاد لە پێویست ڕێزی لێ دەگرت و لە باری پێشەوەی دادەنا ـ ڕووی تێکردو پێی وت: ئەی (ئەبا بەحر) لە من نزیك بەوە، ئەویش هاتە پێشەوەو لە نزیك خۆیەوە داینیشاند، ڕووی خۆی بەرو (ئەحنەف) وەرگێڕاو سەبارەت بە باری گوزەرانی تایبەتی خۆی قسەی لەگەڵ دەکرد.

(إبن خلکان) وتی: ئەمجا خەڵکی عێراق دەستیان بە ستایشکردنی (عبیداللە) کرد، بەڵام (ئەحنەف) بێ دەنگەو هیچ ناڵێت: (معاویە) پێی وت: ئەی (ئەبا بەحر) بۆ قسە ناکەی؟ وتی: ئەگەر قسە بکەم پێچەوانەی ئەوان دەڵێم، (معاویە) پێی وت: بە شایەد بن کە ئەوا (عبیداللە)م لێخست و لە نێوەم کرد، هەستن تێفکرن بزانن چ کەسێك باشە بیکەم بە والیتان ، بۆم دیاری بکەن، پاش سێ ڕۆژی تر بێنەوە لام.

(إبن خلکان) وتی: کاتێك ڕۆیشتنە دەرەوە، تاقمەیەك لە خۆیان ئەم پۆستەیان بۆ خۆیان دەویست، هەشیانبوو بۆ خەڵکی تری دەویست، لەم پێناوەدا بە نهێنی پەیوەندیان بە کەسە تایبەت و نزیکەکانی (معاویە)وە دەکرد تا ئەمەیان بۆ بکات، ئەمجا دوای تێپەڕینی سێ ڕۆژەکە کۆبوونەوەو (ئەحنەف)یشیان لەگەڵدابوو، چوونە کۆڕەکەی (معاویە)وەو بە شێوەی دانیشتنی یەکەم لە شوێنی خۆیانی دانیشاندنەوەو ئەحنەفی لە پەنا خۆی دانیشاندو ماوەیەکی باش قسەی لەگەڵ کرد، ئەمجا وتی: دەربارەی ئەو کارەی کە دەبووایە بیکەن چیتان کردووە؟ ئیدی هەریەکە ناوی کەسێکی دەهێناو وتووێژەکان درێژەیان کێشاو سەریان کێشا بۆ مشت و مڕو ناکۆکی، (ئەحنەف)یش بێ دەنگ بوو، لە ماوەی ئەو سێ ڕۆژەشدا قسەی لەگەڵ کەس نەکردبوو، (معاویە) پێی وت: ئەی (ئەبا بەحر) لەبەرچی قسە ناکەی؟ (ئەحنەف) وتی: ئەگەر بتەوێ کەسێك لەنێو خزمەکانی خۆت بکەی بە والی ئەوا هاوتای (عبیداللە)ت دەست ناکەوێت و ناتوانێ جێی بگرێتەوە، ئەگەر دەتەوێ بیدەی بە کەسێکی بە دەر لە خزمەکانت ئەوە با بە ڕای خۆت بێت،... (إبن خلدون) وتی: ئەوانەی لە دانیشتنەکەی یەکەمدا بە شان و باڵی (عبیداللە)یان هەڵگوتبوو لەم دانیشتنەدا نە ناویان هێناو نە داوای گەڕانەوەشیان کردبوو بۆ سەر پۆستەکەی، جا کە (معاویە) گوێی لە وتەکەی (ئەحنەف) بوو بە (جەماعەت)ی وت: بە شایەد بن ئەوا (عبیداللە)م لە پۆستی ویلایەتەکەی

دانایەوە، هەر هەموویان لەوە پەژێوان بوونەوە کە بۆ ئەویان دیاری نەکرد، (معاویە)ش بۆی دەرکەوت کە ستایشو پێهەڵگوتنەکەیان دەرهەق بە (عبیدالله) بە خۆشی خۆیان نەبووە، بەڵکو هەر ئەو نەریتە باوەیە کە خەڵك لە بەرانبەر سەرانی خۆیاندا خویان پێوە گرتووە، وتی: جا کاتێك خەڵکەکە لە کۆڕی (معاویە) دەرچوون، (معاویە) (عبیدالله)ی جیاکردەوەو پێی وت: چۆن وێنەی ئەم پیاوە ـ واتە ئەحنەف ـ ت بە بەلاش پشتگوێ خستووە، تەماشا ئەو چۆن بەبێ دەنگی جارێك لێی خستیو جارێکی تر دایناییەوە! هەموو ئەو کەسانەش پێش ئەوت خستبوونو پشتی خۆت پێ بەستبوونو کاری خۆت بەوان سپاردبوو ئاوڕیان لێ نەدایەوە، وێنەی (ئەحنەف) وێنەی ئەو کەسە شیاوەیە کە پیاو بیکات بە یاریدەدەرو پشتیوانی خۆی، وتی: جا کە بۆ عێراق گەڕانەوە (عبیدالله) رووی لێناو کردی بە پشتیوانی خۆیو هەڵگری نهێنییەکانی.[١]

لەم بەسەرهاتەدا: هەڵوێستی (معاویە) دەخوێنینەوە کە لە بەرانبەر (ئەحنەفی کوڕی قەیس) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) نواندی، ئەو دەیزانی کە ئەو پایەدارو ژیرو قسە ڕۆیشتووە، بۆیە بەرزی کردەوەو لە خۆی نزیك کردەوەو زۆری ڕێز لێناو بایەخێکی باشی پێدا، ئەم هەڵوێستە لە بواری کەمەنکێشکردنی خەڵکانی خاوەن هێزو کاریگەر لەسەر جەماوەرو لەخۆگرتنیان بە سیاسەتێکی باشو سەرکەوتوو دادەنرێت.[٢]

یەکێکی تر لەو بەسەرهاتانەی کە لە نێوان (معاویە)و (ئەحنەف)دا ڕوویانداوەو، دەبێتە نیشانە لەسەر سینگفراوانی (معاویە)و زانیاری ئەو لە بەرانبەر دەرەنجامی کارەکاندا، ئەمەیە: کاتێك کاروباری (خیلافەت) بۆ (معاویە) جێگیر بوو، ر (ئەحنەف) سەردانی دەکا، (معاویە) دەڵێت: سوێند بە خوا ئەی (ئەحنەف) هەتا ڕۆژی قیامەت ڕۆژی (صەفین)م لەبیر ناچێتەوەو هەر کە دێتەوە بەر چاوم دڵم دەکزێتەوە.

(ئەحنەف) وتی: بە خوا ئەی (معاویە) ئەو دڵانەی بە هۆیانەوە ڕقمان لێ دەبویتەوە لەنێو سینگماندا ماون، ئەو شمشێرانەی بە هۆیانەوە جەنگمان لەگەڵ کردبووی هەر لەنێو کالانەکانیاندان، ئەگەر بە مەبەستی جەنگ قولانجێك نزیك بیتەوە، بستێکت لێ نزیك دەبینەوە، ئەگەر بە ڕۆیشتن بۆمان بێی بە گورگەلۆقە بەرەو ڕووت دێین، ئەمجا هەستاو ڕۆیشتە دەرەوە، خوشکێکی (معاویە) لە پشت پەردەوە گوێی لە قسەکانی دەبێت، دێتو

---

١ وفیات الأعیان (٢/٥٠٤، ٥٠٣).

٢ التاریخ الاسلامي (١٧/٢٤).

دەڵێت: ئەی ئەمیری ئیمانداران، ئەوە کێ بوو هەڕەشەی دەکردن؟ وتی: ئەوە کەسێکە، ئەگەر تووڕە ببێت سەد هەزار کەس لە بەنی تەمیم بەبێ ئەوەی بزانن بۆچیو لەسەرچی تووڕە بووە، بە دەنگیەوە دێنو بە هامڕای ئەو تووڕە دەبن.[١]

د ـ ئەبو قەتادەی ئەنصاری (خودا لێی ڕازی بێت):

(إبن عبدالبر) لە (الاستیعاب)داو بە سەنەدی خۆی هێناویەتیو، دەڵێ: لە (جامع معمر)و بە گوێرەی ڕیوایەتی (عبدالرزاق)،[٢] وتی: (معمر) قسەی بۆ کردین، لە (عبدالله ی کوڕی محمدی کوڕی عقیل)ەوە: ئەو کاتەی (معاویە) هاتە (مەدینە) لە ڕێگا تووشی (ئەبو قەتادەی ئەنصاری) بوو، (معاویە) پێی وت: ئەی (ئەبا قەتادە) جگە لە ئێوەی کۆمەڵی (ئەنصار) هەر هەموو کەس هاتنە پێشوازیم! چ شتێك ڕێی لێ گرتن؟ وتی: وڵاخمان پێ نەبوون، (معاویە) وتی: ئەی وشترە ئاوکێشەکانتان لە کوێن؟ (ئەبو قەتادە) وتی: ڕۆژی (بەدر) کە شوێن تۆو باوکت دەکەوتین سەرمان بڕینو کەوڵمان کردن، وتی: بەڵێ ئەی ئەبا قەتادە.

(ئەبو قوتادە) وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) بە ئێمەی فەرموو: کە دوابەدوای وەفاتی ئەو فەرقو جیاوازی دەبینین، (معاویە) وتی: فەرمانی بە چ شتێك پێ کردن لەو حاڵەدا؟ وتی: بە ئارامگرتن، وتی: دە تا بە خزمەتی دەگەنەوە ئارام بگرنو دان بە خۆتاندا بگرن.[٣]

٥ـ خۆبەکەمگرتن و خۆپارێزی:

(خۆبەکەمگرتن) یەکێك بوو لە سیفەتە هەرە دیارەکانی (معاویە)و ببوو بەیەکێك لە نیشانەکانی کەسایەتی ئەوو بە هۆیەوە ناوبانگی دەرکردبوو، ئەو دوای ئەوە کاروباری گشتی موسڵمانان بە دەستەوە دەگرێتو هەموو خەڵك لەسەری یەکدەنگ دەبنو وەکو سەرۆکێکی بێ ڕکابەر دەبێت، بەڵێ لە لوتکەی دەسەڵاتدایەو لە وتارە گشتیەکانیدا، دان بەوەدا دەنێت کە لە نێو خەڵکدا کەسانێك هەن لە ئەو چاکترن، جارێکیان وتاریداو وتی: ئەی جەماوەر: من هەرە چاکەکەتان نیم، کەسانێکتان تێدایە کە لە من باشترن، (عبدالله ی کوڕی عومەر، عبدالله ی کوڕی عەمرو، کەسانی تریش) لە مێرخاسان، بەڵام ئومێدەوارم من

---

١ وفیات الأعیان (٢/١٨٦).

٢ مصنف عبدالرزاق، رقم (١٩٩٠٩)، مورسەلە چونکە (عبدالله ی کوڕی محمدی کوڕی عەقیل) لە سەردەمی (معاویە)دا نەژیاوەو (ئەبا قەتادە)شی نەدیوە.

٣ الاستیعاب (ص: ٦٧٠)، رقم الترجمة (٢٣٤٦).

لە بواری ویلایەت‌و سەرپەرشتی کردنی کاروبارەکانتاندا لە هەمووتان سوودگەیەنتر بم. چاکتر شکست بە دوژمنتان بدەم‌و خێراتر بە هاوارتانەوە بێم.[١]

ئیمام (أحمد) بە سەنەدی خۆی لە (عەلی کوڕی ئەبلی حەملە)وە ئەویش لە باوکیەوە وتی: (معاویە)م بەسەر مینبەری دیمەشق بینی وتاری بۆ خەڵك دەداو پینەیەکی بە کراسەکەیەوە بوو.[٢]

لە (یونسی کوڕی مەیسەری حەمیری)یەوە وتی: (معاویە)م لە بازاڕی دیمەشق بینی، خزمەتکارێکی بە دواوە بوو، کراسێکی دڕاوی لەبەر بوو و بەنێو بازاڕدا دەهات‌و دەچوو.[٣]

خۆپارێزی (معاویە) گەیشتبووە ئەو ڕادەیەی کە دەڵێن: جارێك کەنیزەکێکی خۆی دەبینێ‌و بە چاوی ئارەزووەوە لێی دەنۆڕێت، بەڵام هەست بە ناتوانایی خۆی دەکات‌و بەو کەسەی بۆی هێناوە دەڵێت: بۆ (یەزیدی کوڕی معاویە)ی بەرە، ئەمجا وتی: نا، (ڕەبیعەی کوڕی عەمروی جرشی)یم بۆ بانگ بکە (ڕەبیعە شەرعزان بوو) کاتێك گەیشت، پێی وت: ئەم کەنیزەکەیان بەم شێوە ڕووتیە بۆ هێنام، منیش ئەو شتانەم پێوە دیت‌و ویستم بۆ (یەزید)ی بنێرم، (ڕەبیعە) وتی شتی وا مەکە ئەی ئەمیری ئیمانداران، تازە ئەوە بە ئەو ناشێت، (معاویە) وتی: باشترین ڕات دەربڕی.

ئەمجا (معاویە) کەنیزەکەکەی بۆ (عبداللە ی کوڕی مەسعەدی فەزاری) نارد، کاتی خۆی (عبداللە) خزمەتکاری (فاطمەی کچی پێغەمبەری خودا (ﷺ)) بوو، ڕەشپێست بوو، (معاویە) پێی وت ڕەنگی منداڵەکانتی پێ سپی بکە.[٤]

(إبن کثیر) لە پەراوێزی ئەمەدا دەڵێت: ئەمە دەری دەخات کە (معاویە) شەرعزان بووەو ویستوویەتی مەسەلەکە ساغ بکاتەوە، چونکە پێشدا بە چاوی ئارەزوو تەماشای کرد، بەڵام خۆی لێ پاراست، لەبەر ئەمە پێی تاوان بوو بیداتە (یەزید)ی کوڕی بە بەڵگەی فەرموودەی خودا: ﴿وَلَا تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ﴾[٥] واتە: ئەو ژنانە لە خۆ مارە مەکەن کە

---

١ البداية والنهاية (١١/٤٣٦).

٢ سير أعلام النبلاء (٣/١٥٢)، الزهد (ص: ١٧٢).

٣ سير أعلام النبلاء (٣/١٥٢)، من سب الصحابة ومعاوية فأمه هاوية (ص: ١٢٩).

٤ البداية والنهاية (١١/٣٩٦).

٥ النساء (٢٢).

پێشدا باوکەکانتان لە خۆیان مارە کردوون، ئەمەو رای (رەبیعەی کوڕی عەمروی جرشی دیمەشقی)یش لەگەڵ ڕاکەی ئەو یەکی گرت.[١]

٦ـ گریانی لە ترسی خودا:

(معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) لەمەجلیسی ڕۆژانەی دانیشتبوو ، ئەم فەرموودەیان بۆ خوێندەوە کە (ئەبو هوریرە) لە پێغەمبەر (ﷺ)ەوە ڕیوایەتی کردووە: سەبارەت بە (قورئان خوێنی ڕیاباز،ماڵبەخشی ڕیاباز، موجاهیدی ڕیاباز)، پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی داوە بۆ یەکەمین جار ئاگری دۆزەخ بەمانە هەڵدەکرێت، فەرموودەکە بەم شێوەیەیە: لە ئەبو هورەیرەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((إن الله تبارك وتعالى إذا كان يوم القيامة ينزل إلى العباد ليقضي بينهم وكل أمة جاثية، فأول من يدعو به رجل جمع القرآن، ورجل يقتل في سبيل الله، ورجل كثير المال، فيقول الله للقارئ: ألم أعلمك ما أنزل على رسولي؟ قال: بلى يا رب، قال: فماذا عملت فيما علمت؟ قال: كنت أقوم به آناء الله وآناء النهار، فيقول الله له: كذبت، وتقول له الملائكة كذبت، ويقول الله: بل أردت أن يقال إن فلاناً قارئ فقد قيل ذاك. ويؤتى بصاحب المال، فيقول الله له: ألم أوسع عليك حتى لم أدعك تحتاج إلى أحد؟ قال: بلى يا رب، قال: ما عملت فيما آتيتك؟ قال: كنت أصل الرحم، وأتصدق، فيقول الله له: كذبت، وتقول له الملائكة كذبت، ويقول الله تعالى: بل أردت أن يقال فلان جواد، فقد قيل ذاك .ويؤتى بالذي قتل في سبيل الله فيقول الله له: في ماذا قتلت؟ فيقول: أمرت بالجهاد في سبيلك فقاتلت حتى قتلت، فيقول الله تعالى له: كذبت وتقول الملائكة كذبت، ويقول الله: بل أردت أن يقال فلا جريء فقد قيل ذلك، ثم ضرب رسول الله صلى الله عليه وسلم على ركبتي فقال: يا أبا هريرة أولئك الثلاثة أول خلق الله تسعر بهم النار يوم القيامة.)) واتە: خوای بەرزو پیرۆز ڕۆژی قیامەت بە مەبەستی دادوەری کردن لە نێوان بەندەکانیدا دادەبەزێت، هەموو نەتەوەکان لەسەر چۆك کەوتوون، یەکەمین کەس بانگ دەکرێت پیاوێکە قورئانی کۆکردووەتەوەوپیاوێکە لە ڕێی خودادا دەجەنگاو، پیاوێکە ماڵی زۆر بووە، خودا بە قورئانخوێنەکە دەفەرمووێت: ئایا من ئەوەم فێر نەکردی کە دامبەزاندە سەر پێغەمبەرەکەم؟ وتی: بەڵێ ئەی پەروەردگار، فەرمووی: چ کارێکت لەوەدا کرد کە فێری بووی؟ وتی: من بە درێژایی شەوو بە درێژایی ڕۆژ دەمخوێندو نوێژم پێ دەکرد، خودا پێی دەفەرمووێت: درۆت کرد، فریشتەکانیش پێی دەڵێن: درۆت کرد، خودا دەفەرمووێت: بەڵکو

---

١ المصدر نفسه.

ویستت پێت بڵێن: فڵانە کەس قورئان خوێنە، ئیدی ئەمە وترا. کابرای خاوەن سەرمایە دەهێنرێت، خودا پێی دەفەرمووێت: ئایا زۆرم پێ نەدایو تا ئەوەی پێویستت بە کەس نەما؟ وتی: بەڵێ ئەی پەروەردگار، فەرمووی: دەربارەی ئەو سامانەی پێم بەخشیبووی چ کارێکت کرد؟ وتی: خزمایەتیم پێ بەهێز دەکردو خێرو خێراتیشم لێ دەکرد، خودا پێی دەفەرمووێت: درۆت کرد، فریشتەکانیش پێی دەڵێن: درۆت کرد، خودا دەفەرمووێت: بەڵکو ویستت پێت بڵێن: فڵانە کەس سەخیو دڵاوایە، ئیتر ئەمە وترا. ئەو کەسە دەهێنرێت کە لە ڕێی خودادا کوژراوە، خودا پێی دەفەرمووێت: لەسەرچی کوژراوی؟ جا دەڵێت: فەرمانم پێکرا جیهاد لە ڕێی تۆدا بکەم، منیش هەتا کوژرام هەر جەنگام، خودای بەرز پێی دەفەرمووێت: درۆت کرد، فریشتەکانیش پێی دەڵێن: درۆت کرد، خودا دەفەرمووێت: بەڵکو ویستت پێت بوترێت ئازاو بوێرە، ئیتر ئەمە وترا). ئەبو هورەیرە وتی: ئەمجا پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەستی بە ئەژنۆدا کێشاو فەرمووی: ئەی ئەبا هورەیرە، ئەم سێ جۆرە کەسانە یەکەمین دروستکراوی خودان لە ڕۆژی قیامەتدا ئاگری دۆزەخیان پێ هەڵدەکرێت، جا کاتێك (معاویە) گوێی لەم فەرموودەیە بوو وتی: ئەمە بەو جۆرە کەسانە بکرێت ئەی دەبێت بە چ خەڵکی تر بکرێت؟ ئەمجا لە قوڵپەی گریانی داو بووڕایەوە، تا ئەوەی خەڵکانی دەوروبەری گومانیان برد مردووە، ئەمجا بە هۆش هاتەوەو دەستێکی بە دەمو چاویدا هێناو وتی: خوداو پێغەمبەرەکەی ڕاستیان فەرمووە: ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَٰلَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ ﴿١٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُ ۖ وَحَبِطَ مَا صَنَعُوا۟ فِيهَا وَبَٰطِلٌ مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾﴾[1] واتە: هەر کەسێك (بە تەنها) ژیانی دنیاو شتە ڕازاوەکانی ئەوی مەبەست بن، هەر لەوێدا پاداشتی کردەوەکانیان دەدەینەوەو هیچ لێیان کەم نابێتەوە، ئا ئەوانە ئەو کەسانەن لە قیامەتدا جگە لە ئاگر هیچ شتێکی تریان دەست ناکەوێت، ئەوەی کردوویانە لە چاکە لەوێدا هەڵدەوەشێتەوە، ئەوەی دەیکەن لەم دنیایە لە قیامەتدا پوچ بووەتەوە.[2]

ئەمانەی باسم کردن گرنگترین سیفەتەکانی (معاویە) بوون، لە میانەی لێکۆڵینەوە لە ژیانیدا دەرم هێنان.

---

١ هود (١٥ـ١٦).

٢ رواه الترمذي والحاكم عن أبي هريرة، وصححه الالباني (١٧١٣).

## سێیەم: ستایشکرانی (معاویە) لە لایەن زانایانەوەو، خوێنینەوەی دەوڵەتی ئومەوی لەنێو جوغزی سەدە هەرە باشەکاندا:

١ـ عومەری کوڕی خەتتاب (خودا لێی ڕازی بێت)

عومەری کوڕی خەتتاب وتی :ئێوە کە (معاویە)تان هەبێتو لە لا بێت، چۆن دەبێت باسی خەسرەوو قەیصەرو زرنگیەکەیان بکەن،[١] (ئەبو محمدی ئومەوی) وتی: (عومەری کوڕی خەتاب) بەرەو شام چوو، (معاویە) بە خۆیو سوپایەکی مەزنەوە پێشوازی لێکرد، کە (عومەر) ئەمەی بینی، پێی وت: ئەی معاویە: بە سوپایەکەوە دەڕۆیو بە سوپایەکی ترەوە دەگەڕێیتەوە؟ هەواڵم پێگەیشتووە بەیانی دەکەیتەوەو خەڵکانی هەژارو خاوەن پێویستی لەبەر دەرگای ماڵەکەت وەستاون، وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران دوژمن لەسەر سنووری (شام)ەوە نزیکە، سیخوڕیان لێرەدا هەن، جا ئەی ئەمیری ئیمانداران ویستم ئیسلام بە هێزو دەسەلاتەوە ببینن.

(عومەر) پێی وت: ئەمە فێڵی پیاوێکی زۆر ژیرە، یان تەڵەکەی پیاوێکی ئەزموندیدەی بە سەلیقەیە، (معاویە) وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران ویستت لەسەر چ شتێکە فەرمانم پێ بکە تا جێبەجێی بکەم، وتی: ئەی بێ قەزا بی، دەربارەی هەر نەنگیەکت ڕەخنەم لێ گرتی بە جۆرێکت وەڵام دامەوە نەمزانی بڵێم بیکە یان مەیکە.[٢]

٢ـ عەلی کوڕی ئەبو تالیب (خودا لێی ڕازی بێت):

(عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران (خودا لێی ڕازی بێت) وتی: فەرمانڕەوایەتی (معاویە)تان لەبەردڵ گران نەبێت، وەڵلاهی ئەگەر ئەو لە دەست بدەن بە چاوی خۆتان دەبینن سەرۆکانێك لەنێو شانی فەرمانڕەوایەتیەوە سەر دەردێنن لە بودەڵەییاندا بە گوژاڵك دەچن.[٣]

ئەمە ئامۆژگاری (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران بوو لە بەرانبەر هاوەڵو لایەنگرانی خۆیدا تا ڕقیان لە (معاویە)و فەرمانڕەوایەتیەکەی شام نەبێتەوە.

٣ـ عبدالله ی کوڕی عومەر (خودا لێی ڕازی بێت)؛ وتی: کەسێکم نەدیوە لە (معاویە) سەردارتر بێت، ڕاویەکە وتی: وتم: عومەریش؟ وتی: (عومەر) لەو باشتر بوو،[٤] لە ڕیوایەتێکی

---

١ المعجم الكبير (٥/٣٣٠)، مرويات خلافة (معاوية) في تاريخ الطبري (ص: ٨٣).

٢ أنساب الأشراف (٤/١٤٧)، الاستيعاب: رقم الترجمة: (٢٣٤٦)، مرويات خلافة علي (ص: ٨٤).

٣ البداية والنهاية (١١/٤٣٠).

٤ المصدر السابقة (١١/٤٣٨).

تردا هاتووە: لە دوای پێغەمبەری خودا (ﷺ)ەوە کەسم نەبینیوە بە قەد (معاویـە) سـەروەر بێت، پێی وترا: (ئەبو بەکر)یش؟ وتی: (ئەبو بەکرو عومەرو عوسمان) لە ئـەو باشـتر بـوون، بەڵام ئەو لە ئەوان سەروەرتر بوو.[١]

٤ـ عبـدالله ی کـوڕی عـەباس(خـودا لێـی ڕازی بێـت): وتـی: پیـاوێکم نـەدیتوە وەکـو (معاویە) لە مەلیکایەتی بوەشێتەوە.[٢] لە صەحیحی بوخاریدا هـاتووە: بـە (عبـدالله ی کـوڕی عـەباس) وتـرا: سـەبارەت بـە (معاویـە)ی ئـەمیری ئیمانـداران چـی دەڵێـی کـە لـە کاتێکدا سوننەتی نوێژی (وتـر) بـە یـەك ڕکـات دەکـات؟ وتـی: ئـەو شـەرعزانە.[٣] جـارێکی تـر باسـی معاویەی لە لا کراو وتی: ماشـەڵلا لـە کوڕەکـەی هینـد بـێ چـەند بـە خێـرو بێـرە! لـە ڕووی ڕەچەڵەکەوە چەند ڕەسەنەو لە ڕووی دەسەڵاتەوە چـەند بەخـشندەیە؟ بـە خـوا نـە لەسـەر مینبەرەوەو نە بەسەر خاکەوە جنێوی پـێ نـەداوین، ئـەو داکـۆکی لەسـەر پاراسـتنی پـشتی خۆیو پشتی ئێمە دەکردەوە.[٤]

کاتێکیش (معاویە) بە بۆنەی وەفاتی (حەسەنی کوڕی عەلی)یەوە سەرەخۆشی لە (عبدالله ی کوڕی عەباس) دەکاتو پێی دەڵێت: دەك خودا بە مەرگی (حەسەن) قەت داماوت نەکاتو قەت تووشی ناخۆشیت نەکات، (عبدالله) بەم شێوەیە وەڵامی دەداتـەوە: تـا خـودا ئـەمیری ئیماندارانمان بۆ بێڵێتو تەمەن درێژی بکات، منیش تووشی داماویو ناڕەحەتی ناکات.[٥]

٥ـ (سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص) (خودا لێی ڕازی بێت) وتی:

لە دوای (عوسمان)ەوە کەسێکم نەدی وەکو ئەم خاوەندەرکو دیوەخانە (واتـە معاویـە) بە هەق دادپەروەری بکات.[٦]

٦ـ أبو هورەیرە (خودا لێی ڕازی بێت): بـەنێو بـازاڕی (مەدینـە)دا دەڕۆیـشتو دەیـوت: وای بۆ ئێـوە دەسـت بـە شـاقەلی (معاویـە)وە بگـرن، دەك خودایـە نەمگەیەنیتـە سـەردەمی سەرۆکایەتی کردنی منداڵان.[٧]

---

١ المصدر السابقة (١١/٤٣٨).

٢ المصدر السابقة (١١/٤٣٩).

٣ البخاري، رقم (٣٧٦٥).

٤ تاريخ دمشق (٦٢/١٢٨، ١٢٩).

٥ مختصر تاريخ دمشق (٦٢/١٢٨، ١٢٩).

٦ سير أعلام النبلاء ٣/١٥٠).

٧ مختصر تاريخ دمشق (٢٥/٧٩)، أثر العلماء (ص: ٨٤).

٧ـ أبو درداء (خودا لێی ڕازی بێت) وتی: لە دوای پێغەمبەری خودا (ﷺ)ەوە کەسێکم نەدیوە نوێژکردنی بە نوێژکردنی پێغەمبەری خودا (ﷺ) بچێت لە نوێژکردنی ئەمیرەکەتان بەولاوە (واتە معاویە).[١]

(إبن تیمیة) دوای ئەوەی ئەم وتانەی (عبداللە ی کوڕی عەباس)و (أبي درداء)ی باس کردن، ئەمجا وتی: ئەمە شایەتیدانی هاوەڵان بوو لەسەر فیقهو دینی (معاویە)، (إبن عباس) شایەتی بۆ دا کە شەرعزانە، (أبي درداء) شایەتی بۆ دا کە نوێژەکەی ڕێکوپێکترین نوێژە، جگە لەوە بەڵگەی زۆر هەن‌و پشتگیری لەم شایەتیدانانە دەکەن.[٢]

٨ـ (سەعیدی کوڕی موسەییەب) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت):

(إبن وهب) لە (مالك)ەوە،ئەویش لە (الزهری)یەوە، وتی: پرسیاری هاوەڵانی پێغەمبەری خودا (ﷺ)م لە (سەعیدی کوڕی موسەییەب) کردو پێی وتم: زوهەری گوێ بگرە، هەر کەسێك لەسەر خۆشەویستی (ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان‌و عەلی) بمرێت‌و شایەتی بۆ دە موژدەپێدراوەکان بە بەهەشت بداتو ڕەحمەت بۆ (معاویە) بنێرێت، ئەوا هەقە خودا بە توندی لێپێچینەوەی لەگەڵ نەکات.[٣]

٩ـ (عبداللە ی کوڕی مبارك) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) وتی:

بە لای ئێمەوە (معاویە) سەنگی مەحەکە، هەر کەسێکمان بینی بە چاوی ڕقەوە لێی دەڕوانێت، ئەوا لە بەرانبەر هەموو هاوەڵاندا تۆمەتباری دەکەین،[٤] هەروەها دەربارەی (معاویە) پرسیاری لێکراو وتی: من قسەیەك دەربارەی پیاوێك ناکەم کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: ((سمع الله لمن حمده))، ئەویش لە پشت ئەوەوە وتبێتی: ((ربنا ولك الحمد))، پێی وترا: کامەیان باشترە؟ ئەو یان (عومەری کوڕی عبدالعزیز)؟ وتی: ئەو تەپوتۆزەی کە لەمیانەی جەنگوجیهادکردنی لە خزمەت پێغەمبەری خودا (ﷺ) دا چۆتە نێو لوتیەوە لە (عومەری کوڕی عبدالعزیز) باشترە.[٥]

---

١ مجمع الزوائد ومنبع الفوائد (٩/٣٥٧)، رواه الطبراني ورجاله رجال صحيح غير (قيس بن الحرث).
٢ منهاج السنة (٦/٢٥٣).
٣ البداية والنهاية (١١/٤٤٩).
٤ البداية والنهاية (١١/٤٤٩).
٥ البداية والنهاية (١١/٤٤٩).

١٠ـ (عومەری کوڕی عبدالعزیز) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت):
(عبدالله ی کوڕی موبارەك) لە (محمدی کوڕی مسلم) لە (ابراهیمی کوڕی میسرة)ەوە وتی: نەمدیوە (عومەری کوڕی عبدالعزیز) لە کەسێك بدات، تەنها لەو کەسەی دەدا کە جنێوی بە (معاویە) دابایە، چەند شوڕکە دارێکی پێ دەکێشا.[1]

١١ـ محمدی کوڕی عبدالله ی کوڕی عماری موصلی‌و کەسانی تریش وتیان: پرسیار لە (المعافى کوڕی عمران) کرا: کامەیان چاکترە؟ (معاویە) یان (عومەری کوڕی عبدالعزیز)؟ (مەعافی) تووڕە بوو و وتی: چۆن پیاوێك لە هەوەڵان دەخەیتە ڕیزی پیاوێکی تابیعی؟، (معاویە) بە نیسبەت پێغەمبەری خودا (ﷺ) هاوەڵ‌و ژنبراو کاتیب‌و ئەمینداری ئەو بووە لەسەر وەحی خودا.[2]

١٢ـ (أحمدی کوڕی حەنبەل) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت): پێی وترا: ڕەحمەتی خوات لێ بێت؟ چ دەڵێی دەربارەی کەسێك کە دەڵێت: ناڵێم (معاویە) کاتبی وەحی بووە، ناڵێم خاڵی ئیماندارانە، چونکە ئەو بە زەبری شمشێر دەستی بەسەر حوکمڕانیدا گرتووە؟! (أبو عبدالله) واتە ئیمام ئەحمەد وتی: ئەمە قسەیەکی بەدو بێ نرخە، خۆتان لە بێژەرانی ئەو قسانە دوور بخەنەوە، لەگەڵیان دامەنیشن، دەبێ خۆیان وئەم درۆیانەیان بە موسڵمانان بناسێنین.[3]

١٣ـ ڕەبیعی کوڕی نافعی حەلەبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت):
وتی: (معاویە) پەردەی سەر هاوەڵانی محمد (ﷺ)ە، ئەگەر یەکێك ئەو پەردە هەڵداتەوە، ئەوا دوای ئەوە دەوێرێت شتی تریش بکات.[4]

١٤ـ (إبن أبي العز الحنفي) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت): دەڵێت: (معاویە) یەکەمین مەلیکی موسڵمانان بوو –تا دنیا بە قیامەت دەگا – هیچ مەلیکێکی موسڵمان لە باشیدا بە ئەو ناگا.[5]

١٥ـ (القاضي إبن العربي المالكي) (ڕحمەتی خوای لێ بێت): (إبن العربي) قسەیەکی لەسەر ئەو سیفەتانە کرد کە لە (معاویەدا) (خودا لێی ڕازی بێت) بەرجەستە ببوون، لەنێو

---

١ البداية والنهاية (١١/٤٥١).
٢ البداية والنهاية (١١/٤٥٠).
٣ الخلال السنة (٢/٤٣٤)، إسناده صحيح.
٤ البداية والنهاية (١١/٤٥٠).
٥ شرح العقيدة الطحاوية (ص: ٧٢٢).

ڕستەی سیفەتەکاندا ئەمانەی باس کردن: پاسەوانی کردنی سنوورو، گرتنی سەنگەرەکانی پێشەوە، چاککردنی هێزی سەربازی، سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا، بەڕێوەبردنی کاروباری خەڵك،[١] لە شوێنێکی تری کتێبەکەیدا: (العواصم من القواسم)دا دەڵێت: (عومەر) کردی بە والی، هەموو هەرێمەکانی وڵاتی شامی خستە ژێر ڕکێفی ویلایەتی ئەو، (عوسمان) لەسەر کارەکەی هێشتەوە، بەڵکو (ئەبو بەکر) (واتە بەر لە عومەر) کردی بە والی، چونکە (یەزید)ی برای کردبوو بە والی، (یەزید)یش ئەوی لە جێی خۆی دانا، (عومەر)یش لەسەر کارەکەی هێشتەوە، (عوسمان)یش لەمەدا خۆی بە (عومەر)ەوە بەستەوەو (معاویە)ی لەسەر پۆستەکەی جێگیر کردەوە، جا تەماشای ئەم زنجیرەیە بکە، هۆنینەوەکەی چەند گشتو توندە !.[٢]

چەسپاوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) کردوویەتی بە کاتیبی خۆی....، ئەمجا (حەسەنی کوڕی عەلی)ی نەوەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) لەگەڵی پێکهاتو پۆستی خیلافەتی بۆ سەلماند.[٣]

١٦ـ (إبن تیمیة) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)؛ دەڵێت: زانایان لەسەر ئەوە یەکڕان کە (معاویە) باشترین مەلیکی ئەم ئوممەتەیە، چوارەکانی پێش ئەو جێنشینی پێغەمبەرێتی بوونو ئەویش یەکەمین مەلیکە، دەسەڵاتی ئەو مەلیکایەتیو ڕەحمەت بوو.[٤] دەڵێت: هیچ مەلیکێك لەنێو مەلیکگەلی موسڵمانان لە (معاویە) باشتر نیەو ناشبێت، هیچ لە خەڵکێکی سەردەمی ئەو مەلیکانەش لە خەڵکی سەردەمی (معاویە) باشتر نیەو نابێت، ئەمە بە بەراورد لە نێوان ڕۆژگاری (معاویە)و ڕۆژگاری دوای خۆیەوە، بەڵام ئەگەر لە نێوان ڕۆژگاری ئەبو بەکرو عومەردا بەراورد بکرێت، ئەوا ڕۆژگاری ئەوان بەسەر ڕۆژگاری ئەودا سەرکەدەوێت، ئەمجا (ابن تیمیە) قسەی (الاعمش) دەهێنێتەوە لەو کاتەدا باسی (عومەری کوڕی عبدالعزیز)ی لە لا کرا، (أعمش) وتی: ئەگەر (معاویە)تان دەدی دەبوایە چتان بگوتایە؟ وتیان: سەبارەت بە گەورەیی ئاقڵو دڵی؟ وتی: نە بە خوا سەبارەت بە دادپەروەریەکەی.[٥]

---

١ العواصم من القواصم (ص: ٢١٠، ٢١١).
٢ المصدر نفسه (ص: ٨٢).
٣ عثمان بن عفان للصلابي (ص: ٣٠٠)، المدينة المنورة فجر الإسلام (٢/٢١٦).
٤ الفتاوى (٤/٤٧٨).
٥ منهاج السنة (٦/٢٣٢)، (٣/١٨٥).

١٧ـ (الذهبي) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت): دەربارەی دەڵێت: ئەمیری ئیمانداران، مەلیکی ئیسلام،[١] دەڵێت: (معاویە) لەو مەلیکە هەرە چاکانەیە کە دادپەروەریەکەیان بەسەر ستەمەکەیاندا زاڵ ببوو، لە گوناه بەری نیە خودا لێی ببورێت.[٢] ـ سەبارەت بە ئەو ئەوەندەت بەسەر ـبزانی کەـ: (عومەر)و پاش ئەویش (عوسمان) کردوویانە بە فەرماندەی هەرێمێکی سەر سنووری سەنگەری ئیسلام، ئەمجا بە ڕێکوپێکترین شێوە ڕێکی دەخات و کاروبارەکانی ڕادەپەڕێنێت و بە دڵاوایی و دڵفراوانیەکەی و ئەقڵی گەورەی ڕەزامەندی خەڵکـ ی هەرێمەکە ـ بە دەست دێنێت..... ئەم کەڵە پیاوە بە ئاقڵی کامڵی و دڵی فراوانی و هێزی زیرەکی و ڕاوبۆچوونە چاکەکانی ـ ماوەیەکی باش ـ بوو بە سەردارو سیاسەتمەداری جیهان.[٣]

١٨ـ (إبن كثير) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: هەر هەموو نەتەوەکانی ئوممەت لە ساڵی (٤١) چل و یەکدا بە یەکدەنگی بەیعەتیان پێدا، لەم ساڵەوە تا ئەو ساڵەی کۆچی دوایی تێدا کرد سەربەخۆ کاروباری دەوڵەتی ڕادەپەڕاند، جیهاد لە وڵاتی دوژمندا بە گەڕ خرابوو، وشەی خودا بەرز ببۆوە، لە چواردەورەی زەمینەوە دەستکەوتەکانی بۆ دەهاتن، موسڵمانانی سەردەمەکەی لە ژێر سایەی دادپەروەری و چاوپۆشی و لێبوردنی ئەودا بە ئاسودەیی دەیانگوزەراند ،[٤] دەڵێت: ئەو (واتە معاویە) ئاقڵ و سینگ فراوان و بە ویقار بوو، لەنێو خەڵکدا سەرۆک و سەروەر بوو، بەخشندەو دڵاوا و دادپەروەرو جوامێر بوو،[٥] هەروەها دەربارەی دەڵێت: ژیاننامەیەکی چاک و پاکی هەبوو، خودان چاوپۆشیکردن و لێبوردنێکی نەجیب و ناوازە بوو، زۆری عەیب و عارو نەنگی خەڵکی دەپۆشین خودای باڵادەست ڕەحمی پێ بکات.[٦]

١٩ـ (ابن خلدون) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت:

پێویستە دەوڵەتی (معاویە)و مێژووەکەی بە دەوڵەتی خەلیفەڕاشیدەکان و مێژووی ئەوانەوە بلکێنرێت، چونکە (معاویە) لە چاکەکاری و دادپەروەری و هاوەڵایەتیدا بەبێ

١ سير أعلام النبلاء (٣/١٢٠).
٢ المصدر نفسه (٣/١٥٩).
٣ المصدر نفسه (٣/١٣٢ـ١٣٣).
٤ البداية والنهاية (١١/٤٠٠).
٥ البداية والنهاية (١١/٣٩٧).
٦ البداية والنهاية (١١/٤١٩).

پـــسانەوە بـــە دوای ئـــەوان (خەلیفانـــە)دا هـــاتووە، لـــە ڕاســـتیدا (معاویـــە) لـــە ڕیـــزی خەلیفەرشاشـــیدەکان دەژمێردرێـــت، مێژوونووســـان لەبـــەر دوو هـــۆ لـــە مێـــژووی ئـــەوانیان دەرکردووە:

یەکەم: (خیلافەت) لە سەردەمی ئەودا بـە خـاتری سـەرهەڵدانی دەمـارگیری زاڵ کرابـوو، بەڵام پێش ئەو بە هەڵبژاردن‌و لە ڕێی کۆبوونەوە (ی ئەهلی حەللو عەقد)ەوە دەکرا، جا ئەم دوو حاڵەتەیان لێك جودا کردوونەوە.

(معاویە) یەکـەم خەلیفـەی ڕیـزی ئـەو خەلیفـە زاڵانەیـە کـە لـە ڕێـی هێـزی دەمـارگیری‌و تەوژمی تایەفەگەریەوە بوون بە خەلیفە، ئـەو خەلیفانـەی خـەڵکانی هـەوایی‌و بـێ بەڵگـە بـە (مەلیك) ناویان دێنن‌و هەندێکیان بە هەندێکیان دەچوێنن، –حاشایەکی خودا– (معاویە) بـە یەك کەسێك لە دەسەڵاتدارانی دوای خۆی بچێت، بێگومان ئەو لە ڕیزی خەلیفە ڕاشیدەکانە، هـەموو ئـەو خەلیفانـەش لـە خەلیفـە مەڕوانیـەکان‌و عەباسـیەکان ئەوانـەی لـە دینـداری‌و چاکەکاریدا بە دوای ئەودا هاتوون، لە ڕیزی خەلیفە ڕاشیدەکانن، ناگوترێ: (مەلیکایەتی) لـە پلەو پایەدا لە (خیلافەت) نزمترەو چۆن خەلیفایەتی دەبێتە مەلیکایەتی؟ بزانە: ئـەو جـۆرە مەلیکایەتیەی پێچەوانەی خیلافەتە، بەڵکو دژایەتی دەکات: ئەوە مەلیکایـەتی خۆسـەپێنی‌و (خوسـرەوی)و (دیکتـاتۆری)یـەو ئەمـە ئەوەیـە کـە کاتێـك (عومـەر) (معاویـە)ی بینـی‌و دیاردەکانی ئەم جۆرەی پێوە بینین ڕەخنەی لێگرت، بەڵام ئەو جۆرە مەلیکایەتیەی بەهێزو دەسەڵات‌و پشتیوانی ڕەگەزی بەدەست دەکەوێت، دژایەتی (خیلافەت)و (نوبووەت) ناکـات، (سولەیمانی کوڕی داود)و (داود)ی باوکی (سەڵات‌و سەلامی خوایان لەسـەر بێـت) لـە هـەمان کاتدا پێغەمبەر بـوون (مـەلیك)یـش بـوون‌و بەوپـەڕی ڕێکـوپێکی گوێڕایـەڵ‌و فەرمانبـەرداری پەروەردگاریان بوون‌و کاروباری دونیاشیان هەڵدەسوڕاند، (معاویە) بـە هـۆی پۆسـتەکەیەوە تووشـی سەرکەشـی نـەبوو و سـامانی دنیـای کـۆ نـەدەکردەوە، بـەڵکو کاتێـك موسـڵمانان دەستیان بەسەر تەواوی دەوڵەتاندا گرت، ئیدی بە تەبیعەتی حاڵ (معاویە) سـواری شـەپۆلی هێـزی تایەفەگـەری‌و دەمـارگیری بـوو و چـووە سـەر پۆسـتی دەسـەڵات، ئـەو خەلیفـەی موسڵمانان بوو، بەڵام بەهۆی سەرهەڵدانی ئینتیمای تایەفەگەری لەنێو نەتەوەکانی ئیسلامدا ئەوا بە تەبیعەتی حاڵ چۆن (مەلیك) بانگی خەڵکەکەی دەکـات ئـەویش بـەو چەشـنە بـانگی خەڵکی خۆی دەکرد، کاروباری خەلیفە دیندارەکانی دوای خۆیشی هەر ئاوا بووە، هەر کاتێك سروشتی خـەڵکانی ژێردەسـتیان‌و کەش‌و هـەوای سـەردەمەکەیان ناچـاری کـردبن شـێوازی مەلیکایەتی لە هەڵسوڕاندنی حوکومەتەکانیانداو چەسپاندنی دەستوورو بەنـدە قانونیـەکانی

شەرع پەیڕەو بکەن ئەوا ئەمەیان کردوو، بەڵام نابێت کردارو هەڵوێستەکانیان بە شێوەی گۆترەکاری حیسابیان بۆ بکرێت، بەڵکو دەبێت بخرێنە تەرازووی شەرعەوەو لە بەرانبەر ئاوێنەی سیستەمی حوکمڕانی پێغەمبەرایەتی ڕابگیرێن، ئیتر ئەگەر لەگەڵ شەرع تێکیان کردەوە ئەوا خاوەنەکانیان خەلیفەی پێغەمبەر (ﷺ) بوون، کرداری هەر یەکێکیشیان لەگەڵ شەرع تێکی نەکردەوە ئەوا ئەو کەسە مەلیکێکی دنیایی بووە، ئەگەرچی بە (مجاز)یش پێی وترابێت (خەلیفە).

دووەم هۆکار: باسی (معاویە)یان خستۆتە ڕیزی خەلیفەکانی (ئومەوی)و لە باسی (چوار خەلیفەکان) یان جودا کردۆتەوە، چونکە (معاویە) لە ڕەچەڵەکی ئومەوی بووە، بەڵکو ئەو سەرۆکیان بووە، هەرچی چوار خەلیفەکان بوون لە ڕووی پشت‌و خزمایەتیەوە لێکتر جیاواز بوون، بۆیە مێژوونووسان لە یەك چوارچێوەدا باسیان لێوە کردوون، ڕاستە عوسمان لە ڕەچەڵەکی ئومەوی بووە، بەڵام بە هۆی هاوشانبوونی لەگەڵ سێ دەستەبرایەکەیدا لەچاکەکاری‌و پلەو پایەی بەرزیەوە لەگەڵ ئەماندا باس دەکرێت.[1] لێرەدا هەموو وتەکانی (إبن خلدون) بەهەند وەرناگیرێن، چونکە جۆرێك زێدەڕەویان تێدایە.

ئەمەی ڕابورد ژمارەیەك وتەی زانایانی ئەم ئوممەتە بوون لە هاوەڵان‌و تابعین‌و شوێنکەوتووانیان سەبارەت بە ستایشکردنی (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) کە ئەو:

یەکەمین مەلیکی موسڵمانان‌و بەڵکو لە پێشەوەی هەرە چاکەکانیان بووە کە دادپەروەریەکەیان بەسەر جەورو ستەمیاندا زاڵ بووە، هەڵبەتە بێ گوناه نەبووەو ئومێد وایە خودا لێی ببورێت، وەکو بۆ خۆی دەربارەی خۆی دەڵێت: ئەو لەسەر (دین)ێکە خودا بە هۆی ئەنجامدانی کاری چاکە پاداشتی تێدا دەداتەوەو بە هۆی کردنی تاوانەوە سزای تێدا دەدات، مەگەر خودا بیەوێت لە یەکێك خۆش ببێت، (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت)و دەوڵەتەکەی‌و دەوڵەتی (ئومەوی) بە گشتی لە لایەن هەندێك نوسەرەوە ڕووبەڕووی تیرو توانج‌و پرتەو بۆڵە بوونەوە، هەندێکیان دەڵێن: ئەم دەوڵەتە دەوڵەتی (مەدینە) واتە (شار) بووە، هەندێکی تریشیان دەڵێن: دەوڵەتێکی (عەرەبی) بووەو (ئیسلامی) نەبووە، هەندێکی تر دەڵێن: دەوڵەتێکی (عەلمانی) بووەو پەیوەندی بە (دین)و (ڕەوشت)ەوە نەبووە.

---

١ تاریخ إبن خلدون (ص: ٥٢٨، ٥٢٩).

بێگومان ئەمانە هەموویان درۆو دەلەسەنو ڕاستیەکانی دینو شایەتیدانەکانی مێژوو لێکیان هەڵدەتەکێنن، تەماشاکە: دەوڵەتی ئومەوی لە ساڵی (٤٠)ی کۆچیەوە دەستی پێکردو تا ساڵی (١٣٢)ی کۆچی بەردەوام بوو، سەردەمەکەیان کەوتۆتە نێو بازنەی ئەو سێ سەدەوە، کە باشترین سەدەکانی ئۆممەتن، سەدەی هاوەڵان، سەدەی تابعین، سەدەی شوێنکەوتووانی تابعین.[١] فەرموودەیەکی فرەی (صەحیح) سەبارەت بە ئەمە لە پێغەمبەری خودا (ﷺ)ەوە گێڕدراونەتەوە، وەکو فەرموودەکەی إبن مسعود: ((خیر القرون قرني، ثم الذین یلونهم، ثم الذین یلونهم))[٢] واتە: باشترین چینی ئۆممەت چینی سەردەمی منن (کە بریتین لە هاوەڵان) ئەمجا ئەوانەی کە لە دوای ئەواندا دێن (کە بریتین لە تابعین) ئەمجا ئەوانەن کە بە دوای ئەماندا دێن (کە بریتین لە شوێنکەوتووانی تابعین). فەرموودەکەی (عمرانی کوڕی حصین) ئاوایە: (((خیرکم قرني، ثم الذین یلونهم، ثم الذین یلونهم))، واتە: باشترینتان چینی سەردەمی منە، ئەمجا ئەوانەن کە بە دوای ئەواندا دێن، ئەمجا ئەوانەن کە بە دوای ئەواندا دێن، (عیمران) وتی: نازانم: پێغەمبەر دوو سەردەمی باس کردن یان سێ سەردەم.[٣] هەروەها فەرموودەکەی (ئەبی سەعیدی خودری) کە بە (مەرفوع)ی هێناویەتی: ((یَأْتِي زَمَانٌ یَغْزُو فِئَامٌ مِنْ النَّاسِ فَیُقَالُ فِیكُمْ مَنْ صَحِبَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمَ فَیُقَالُ نَعَمْ فَیُفْتَحُ عَلَیْهِم ثُمَّ یَأْتِي زَمَانٌ فَیُقَالُ فِیكُمْ مَنْ صَحِبَ أَصْحَابَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمَ فَیُقَالُ نَعَمْ فَیُفْتَحُ ثُمَّ یَأْتِي زَمَانٌ فَیُقَالُ فِیكُمْ مَنْ صَحِبَ صَاحِبَ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمَ فَیُقَالُ نَعَمْ فَیُفْتَحُ ))[٤] واتە: زەمانێك دێت كۆمەڵە خەڵكێك دەچن بۆ جیهاد، پێیان دەوترێت: کەستان لەگەڵ هاوەڵایەتی پێغەمبەر (ﷺ)ی کردبێت؟ پێیان دەوترێت: بەڵێ، جا فەتحیان بۆ دەکرێتو سەر دەکەون، ئەمجا زەمانێك دێت (و کۆمەڵێکی تر وەکو ئەوانی پێشوو بۆ جیهاد دەچن)، پێیان دەوترێت: کەستان تێدایە هاوەڵایەتی هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ)ی کردبێت؟ لە وەڵامدا دەوترێت: بەڵێ، جا فەتحیان بۆ دەکرێت، ئەمجا زەمانێکی تر دێت (و دیسان کۆمەڵێکی تر بۆ جیهاد دەچن)، پێیان دەوترێت: ئایا کەسی واتان لەگەڵە

---

١ تاریخنا المفتری علیه، یوسف القرضاوي (ص: ٦٢).

٢ متفق علیه، اللؤلؤ والمرجان فیما إتفق علیه الشیخان (رقم: ١٦٤٥).

٣ المصدر نفسه (رقم: ١٦٤٦).

٤ المصدر نفسه (رقم: ١٦٤٧).

هاوەڵایەتی هاوەڵی هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ)ی کردبێت: لە وەڵامیاندا دەوترێت: بەڵێ: جا فەتحیان بۆ دەکرێت.

وتەی (قَرْنِي) بە واتای (خەڵکی سەردەمی من) دێ، کە بریتین لە هاوەڵان، ئەمجا سەردەمی تابعینو دوای ئەوانیش سەردەمی شوێنکەوتووانی تابعین، هەندێك لە توێژەرەوانی (فەرموودە)، واتای (قرن)یان لە (زمان)دا سنووردار کردووە، هەندێکیان دەڵێن: قەرن چل ساڵە، هەندێکی تریان دەڵێن: هەشتا ساڵە، غەیری ئەمانەش وتوویانە: سەد ساڵە، ئەمەی دوایە بووەتە ڕاستیەکی عورفیوباوو مەشهور لەنێو خەڵکدا، بەپێی ئەم ڕایە (دەبێ سەردەمە وەسفکراوو بە چاکە باسکراوەکە: بریتی بێت لە سێ سەد (٣٠٠) ساڵی یەکەم، بەڵام ئەمە لەگەڵ واقعی مێژوودا ڕێك ناکەوێتو ناگونجێنرێت، ڕای پەسەند ئەو ڕایەیە کە لە پێشدا لێکماندایەوەو کەمێك پێشتر باسمان کرد، کە بریتیە لە (سەردەمی هاوەڵان، سەردەمی تابعین،سەردەمی شوێنکەوتووانی تابعین).[1]

یەکێکی تر لەو فەرموودە صەحیحانەی کە دەبێتە بەڵگەی پایەبەرزی دەوڵەتی (ئومەوی) لە مێژووی ئیسلامدا ئەم فەرموودەیەیە کە (بوخاری) لە (الجامع الصحیح)ەکەیداو لە (خالدی کوڕی مهران)ەوە ڕیوایەتی کردووە، کە (عومەیری کوڕی ئەسوەدی عەنسی) قسەی بۆ کردووە، کە ئەو چووەتە ماڵی (عوبادەی کوڕی صامت) لە شاری (حمص)و (ئومو حەرام)ی هاوسەریشی لە ماڵ دەبێت، (عومەیر) وتی: (أم حرام) قسەی بۆ کردینو دەیوت: کە ئەو گوێی لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بوو دەیفەرموو: ((أول جيش من أمتي يغزون البحر قد أوجبوا)) واتە: یەکەمین سوپا لە ئوممەتی من جیهادی دەریا دەکەن بە هۆی ئەم کارە مەزنەیانەوە چوونە بەهەشتیان بۆ واجب دەبێت، (أم حرام) وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) منیان تێدام؟ فەرمووی: (أنت فيهم) تۆ لە نێویاندای. ئەمجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((أول جيش من أمتي يغزون مدينة قيصر مغفور لهم)) واتە: یەکەمین سوپا لە ئوممەتی من هێرش دەبەنە سەر شاری (قەیصەر) خودا لێیان خۆش دەبێت. دیسان وتم: ئەی ڕەسولی خودا منیان تێدام؟ فەرمووی: ((لا))[2] واتە: نەخێر. شاری (قەیصەر) بریتی بوو لە (قوستەنتینیە)ی پایتەختی دەوڵەتی بیزەنتی.[3]

---

١ تاريخنا المفترى عليه، القرضاوي (ص: ٦٢).

٢ البخاري رقم (٢٩٢٤).

٣ تاريخنا المفترى عليه (ص: ٦٣).

توێژەرەوان دەڵێن: ئەم فەرموودە سەروەریەكی بۆ (معاویە) لەخۆگرتووە: چونكە ئەو لە سەردەمی خیلافەتی (عوسمان)دا یەكەمین فەرماندەی سوپایەك بوو جەنگی دەریایی[١] ئەنجام بدات، ئەو زۆری داوا لە (عوسمان) كردو زۆری لەبەر هەڵخوێند تا ڕێی ئەم جۆرە جەنگەی پێدا، ئیدی هێزی كەشتیڕانی ئیسلامی لە سەردەمی (عوسمان)دا دامەزراو لە سەردەمی (معاویە)دا پەرەی پێدراو بەرفراوان كرا.[٢]

لەم جەنگەدا[٣] (أبو أیوبی ئەنصاری) كە لە نێو سوپاكەدا بوو كۆچی دوایی كردو وەصێتی كرد لەسەر شانی خۆیان هەڵی بگرنو ببەن لە بەرانبەر دەروازەی قوستەنتینیە بینێژن، ئەوەی بە لای ئێمەوە جێی بایەخە ئەوەیە: خودا لە تەواوی ئەم سوپایە خۆش بووە، كە لە سەردەمی ئومەویەكاندا بووە، چونكە ئەم جەنگە لە ساڵی ٥٢ی كۆچیداو لە سەردەمی (معاویە)دا ئەنجام دراوە، هەر كەسێك لە ژیاننامەی (معاویە) بنۆڕێت، بە تایبەتی دوای ئەوەی كە (حەسەن)ی نەوەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە پۆستی خیلافەت دابەزیو پۆستەكەی ڕادەستی ئەو كرد، ئەگەر بێتو بە ویژدانەوە لەو ژیاننامە خورد بێتەوە دەبینێ: ئەم پیاوە هەوڵی شەوو ڕۆژی بە خاتری بەرپاكردنی ئیسلامو دروشمو قانونەكانیو شوێن هەڵگرتنی هەنگاو بە هەنگاوی سوننەتەكانی پێغەمبەر (ﷺ) بووە لە تەواوی بوارەكانی ژیاندا.

---

١ ئەم جەنگە یەكەمە (غەزای قوبروص)ی پێ دەوترێت، لە ساڵی (٢٧)ی كۆچیو لە سەردەمی خیلافەتی (عوسمان)دا بە سەركردایەتی (معاویەی كوڕی ئەبو سوفیان) ئەنجامدرا، لەم جەنگەدا (ئەبو ذەرو ئەبو دەرداء)و ژمارەیەك هاوەڵی تر لەنێو سوپاكەدا بوون، (أم حرام) لە گەڕانەوەدا ولاخەكەی هەڵیداشتو مرد، أخرجه الثلاثة-أسد الغابة (٤٣/٣)، ئەمە بە نیسبەت بڕگەی فەرموودەی یەكەم (أول جیش من أمتي یغزون البحر قد أوجبوا) وەرگێڕ.

٢ تاریخنا المفترى علیه، د. یوسف اقرضاوي (ص: ٦٣).

٣ ئەمە جەنگی دووەمەو (غەزای قوستەنتینیە)ی پێ دەوترێت: (معاویە) لە ساڵی (٥٢)ی كۆچیداو بە سەركردایەتی (یەزید)ی كوڕی سوپایەكی بەرەو (قوستەنتینیە) بەرێكردو ژمارەیەك لە گەورە هاوەڵانی وەكو (أبو أیوب خالدی كوڕی یەزیدی ئەنصاری) (خودا لێیان ڕازی بێت)ی لەگەڵ بوو كە لەوێ وەفاتی كرد، ئەم جەنگە بڕگەی دووەمی فەرموودەكە: ئاماژەی پێ دەدا: ((أول جیش من أمتي یغزون مدینة قیصر مغفور لهم))، البدایة والنهایة (٢٨٤/٦) وەرگێڕ.

## باسی دووەم

## پەیوەندی نێوان (ئوممەت)و (معاویە) وەکو سەرۆکی دەوڵەت:

چۆن خەلیفەو ئوممەت خاوەن مافن، بە هەمان شێوە هەریەکەیان کۆمەڵێك ئەرکی لەسەر شانەو لە بەرانبەر ئەنجامدانیدا لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکرێت، لێرەدا هەندێك ڕۆشنایی دەخەینە سەر ئەم بابەتە:

## یەکەم: ئەرکەکانی سەرشانی خەلیفە:

شەرعزانان ئەرکەکانی سەرشانی سەرۆکی دەوڵەتیان ڕوون کردوونەتەوە، ئاستی هەموو ئەو کارو ئەرکە گرنگانەیان دیاری کردوون کە دەکەونە ئەستۆی ئەو، هەرچەندە دەربڕینی زانایان سەبارەت بە ئەم واجباتانە جیاواز بێت، بەڵام دەکرێ بڵێین هەر هەموویان لە نێوەڕۆکیاندا لە بازنەی پاسەوانیکردنو پارێزگاری کردنی تەواوی بەرژەوەندیە دینیو دنیاییەکان تێناپەڕن، هەندێك لەو ئەرکانە:

١ـ پاسەوانیکردنی دین: دەبێ لە پێناوی پاراستنو پاسەوانیکردنی دینو بەرپەرچدانەوەی هەر جۆرە خراپەو شەڕێك ڕووبەڕووی دین دێت لە ڕووی عەقیدەوە یان بەشەکانی تریەوە هەموو هەوڵو تەقەلاکانی خۆی بخاتەگەڕو دەست بە هەموو ئەو هۆکارو ئامرازانە بگرێت کە بۆ پێکانی ئەم ئامانجە پێویستن، (ماوردی) بەم شێوازە قسە لەسەر ئەمە دەکا: پارێزگاری کردنی (دین) لەسەر بنەما جێگیرەکانیو ئەو شتانەی پێشینانی ئوممەت لەسەریان یەك دەنگ بوونو ئیجماعیان لەسەر کردووە، ئەگەر بیدعەچیەك یان سەر لێتێکچوویەك دەرکەوت، ئەوا بە بەڵگە ناهەقیەکەی خۆیو هەقیانەتی ئیسلامی بۆ ڕوون دەکاتەوەو بە ئەرکو مافەکانی هاوڵاتی بوونیەوە پابەند دەکات، ئەمە لە پێناوی ئەوەدایە تا دین لە تێکدانو شێواندن بپارێزرێتو ئوممەتیش لە هەڵخلیسکانو سەرلێتێکچوون بە دوور بگیرێت.[1]

٢ـ دانانی دەسەڵاتی دادوەری: تا بە بڕیارو قانونە شەرعیەکان کێشەکانی نێوان خەڵك چارەسەر بکرێنو دەستدرێژیکار لە دەست سزاو تۆڵە دەرنەچێتو مافخوراویش بتوانێت ئەو مافانەی خۆی بە دەست بێنێتەوە کە شەرع پێی ڕەوا دیتوون،[2] لەمەولاو لەم کتێبەدا باسی (دامەزراوەی دادوەری)ی (دەوڵەتی ئومەوی) دەکەین.

---

١ الأحكام السلطانية (ص: ١٥).

٢ رئاسة الدولة في الفقه الاسلامي (ص: ٣٦٥).

٣ـ دابینکردنی ئاسایش‌و ئارامی بۆ هەمموو تاکەکانی ئوممەت: تا هەموو کەس لە خۆی‌و خێزانی‌و ماڵی ئەمین بێت‌و بتوانێت لە ژیانێکی بێ وەی‌و ئاسوودە بەهرەمەند ببێ.

٤ـ جێبەجێکردنی حوکمە سزاییەکان (أحكام الحدود) بەسەر ئەو تاوانکارانەدا کە شیاوی (حەد) لێدەرکردن دەبن، لێرەدا جیاوازی ناخرێتە نێوان کەسانی خاوەنپایەو کەسانی ئاستنزم، بە زاراوی (ماوردی) بەم کارە سنووری حەرامەکانی خودا لە بەزاندن دەپارێزرێن‌و تەواوی مافی بەندەکانیشی لەبەرانبەر خەتەری بەزایەدان شوورە دەکرێن.

٥ـ شورەکردنی سنوورە سەنگەرنشینەکانی وڵاتی ئیسلام بە هێزێکی تۆکمەو دامەزراو: تا کەلێنێك بۆ دوژمنانی ئیسلا نەهێڵرێتەوە بەوێدا دزە بکەن‌و موسڵمانان غافڵگیر بکەن، پێویستە لەسەر سەرۆکی ئوممەت لە پێناو پاراستنی ئۆممەت لەبەرانبەر زەبرو گورزی دوژمنانی تەواوی هۆکارو ئامرازەکانی پاراستن‌و بەرگری دەستەبەر بکات.

٦ـ ئەنجامدانی فەریزەی جیهادو، جەنگان لە بەرانبەر دوژمنانێك بەرپەرچی بانگەوازی ئیسلام دەدەنەوە، تا ئەوەی دێنە نێو ئایینی ئیسلامەوە، یان بە ئاینی خۆیانەوە دێنە ژێر حوکمی ئیسلامەوەو حوکمەکانی (أهل الذمة)یان بەسەردا جێبەدێ دەکرێن.

٧ـ کۆکردنەوەی داهات: جا ئیتر بریتی بێت لە خێرو زەکات یان دەستکەوتی ئەو سەرکەوتنانەی بەبێ جەنگ بەسەر دوژمناندا تۆمار دەکرێن‌و پاشان ڕامکردنی بە پێی ئەو بنەمایانەی شەرع بە دەق یان بە ئیجتیهاد بەبێ زیادو کەم داینراون، زیادە لە زەکاتدەران نەسێنرێت‌و تەنگیان پێ هەڵنەچنرێ‌و کەمیش نەدرێت بە موستەهەقانی وەکو: هەژاران‌و نەداران‌و کارمەندانی سەری‌و زیانیان پێ نەگەیەنرێ.

٨ـــ دیاریکردنی بڕی موچە بۆ مستەهەقان لە بەیتولمال، وەکو موچەی خێزانە هەژارەکان‌و موچەی سەربازان‌و کارمەندان‌و، کارکردن بۆ دانانی چەند هێڵێکی گشتی‌و بنەمایەکی شەرعی بۆ چاك ڕاپەڕاندنی ئەم واجبە.

٩ـ هەڵبژاردن‌و دیاریکردنی کەسانی شایستەو لێوەشاوەو دیندارو گونجاوو جێی متمانە بۆ پۆستی سەرکردایەتی کردن، لە پێناوی ئەوەدا جڵەوی کاروبارەکان بکەونە بەردەستی کەسانێك لە خودا بترسن‌و مافەکانی خەڵك بە زایە نەدەن.

١٠ـ چاودێری‌و سەرپەرشتیکردنی ڕاستەوخۆی کاروبارەکانی پەیوەست بەو واجباتانەی کە دەبێت لە بەرانبەر ئۆمەتدا جێبەجێیان بکات، چونکە کەموکوڕی کارمەندەکانی لە کاتی ئەنجامدانی کارەکانیاندا بەسەر ئەودا دەشکێنەوەو ئەگەر لە سەرپەرشتیکردن‌و بەدواداچوونیاندا کەمتەرخەمی بکات ئەوا لە بەرانبەر خودا بەرپرسیار دەبێت‌و لێپێچینەوەی

لەگەڵ دەكرێت، وەكو پێغەمبەر (ﷺ) ڕوونـی كردووەتـەوە، سـەرۆك شـوان‌و چـاودێرەو لـە بەرانبەر ڕەعیەتەكەیدا بەرپرسیارە.

١١ـ ڕاوێژ (شورا): چونكە یەكێكە لە نیشانە گەورەكانی حوكمی ئیسلامی.[١]

بە ئیزنی خودای باڵادەست لەمەولا تەماشا دەكەین كـە (معاویـە)و خەلیفـەكانی ئومـەوی مامەڵەیان لەگەڵ ئەم واجباتانە چۆن‌و چەند بووە، نامانەوێت پـێش ڕووداوەكـان بدەینـەوە، بەڵكو لە بەرانبەر هەر واجبێك لەم واجباتانەو لە شوێنی خۆیدا هەڵوێستە دەكـەین‌و دووری‌و نزیكی خەلیفەكانی ئومەوی لە بەرانبەر جێبەجێكردنیاندا دەزانین.

## دووەم: مافەكانی خەلیفە:

(خەلیفە) لە بەرانبەر ڕاپەڕاندنی كاروباری گشتی ئوممەتداو خـۆ تـەرخانكردنی بـۆ ئەمـە چەند مافێكی دەكەوێتە سەر ئوممەت، زانایانی ئیـسلام ئـەو مافانـەیان ڕوون كردوونەتـەوە، گرنگترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

١ـ گوێڕایەڵیكردن‌و فەرمانبەرداریكردنی: هەموو ئەو فەرمانانەی دەریان دەكات مادام لـە چوارچێوەی چاكەدان‌و دژایەتی حوكمە دیارو ڕۆشنەكانی ئیسلام ناكەن‌و خۆیـشی پێیانـەوە پابەند دەبێت‌و لە سنوورە شەرعیەكان دەرناچن، لێرەدا مافی سەرۆكی دەوڵەتە هاووڵاتیـان جا (ئەهلی حەللوعەقد)بن كە ڕاستەوخۆ بەیعەتیان پێداوە، یان تەواوی خەڵكی بـن‌و ئـەو بـە سەرۆكی خۆیان دابنـێن، واجبـە لەسـەریان پابەنـدی هـەموو ئـەو بڕیارانـەی بـن كـە دەریـان دەكات.

٢ـ سەرخستنی: مـادام سـەرۆكی دەوڵـەت حـوكم بـە ئیـسلام دەكـات‌و دەسـتوورەكەی پەیڕەو دەكات، ئەوا واجبە لەسەر تێكڕای ئوممەت پشتگیری لێ بكەن‌و لە بەرانبەر خەڵكانی هەڵگەڕاوەو ئەوانەی چەكیان لە دژ هەڵگرتووە سەری بخەن، چونكە لە واقیعدا سەرخـستنی ئیمـامی هـەق بریتیـە لـە سەرخـستنی خـودی خۆیـان (واتـە موسـڵمانان)و پـشتیوانیكردنی كاركردن بە شەریعەت‌و بەرگرتن بە تاوانكەلێك كە لە لایەن دەستدرێژیكارانەوە دەردەچن.

٣ـ بڕینەوەی موچەیەك بۆی: بەشی بكات‌و ژیانی خۆی‌و خێزانەكـەی پـێ هەڵـسوڕێنێت، چونكە سەرۆكی دەوڵەت بـە مـشورخواردن‌و ڕاپەڕانـدنی كاروبـاری موسـڵمانانەوە سـەرگەرم دەبێت‌و هیچ ماوەو دەرفەتێكی وای بە دەسـتەوە نامێنێـت تـا بتوانێـت ڕۆزی بـۆ گـوزەرانی خۆی‌و خێزانەكەی دەستەبەر بكـات، بۆیـە پێویـستە موچـەیەكی وای بـۆ دیـاری بكرێـت كـە

---

١ رئاسة الدولة في الفقه الاسلامي (ص: ٣٥٨).

بێنیازی بکاتو شایانی پۆستەکەی بێت، بەڵام نابێت زیادەڕۆیی لەمەدا بکرێت، چونکە ئەو موچەیە لە (بیت المال)و سامانی گشتی موسڵمانان دێتەدەر کە پێویستە ئیحتیات لە خەرجکردنیدا بکرێت.

٤ـ ئاگادارکرانەوەی لە هەواڵی والیو قازیو تەواوی کاربەڕێوەبەرە باڵاکانی، ئەگەر لە سنووری قانونی حکومەتەکەی دەرچوون، چونکە (ئیمام) لە ڕووی شەرعەوە ئەرکی سەر شانیەتی بەدواداچوون بکات لەسەر ئەو کارو پرۆژانەی بەرپرسە باڵاکانی ئەنجامیان دەدەن، ئەگەر خواریو ناڕێکیەکیان تێدا بوو دەبێت ڕاستیان بکاتەوەو، لە بەرانبەر فەرامۆشکردنی ئەو کارانەی کە دەبوایە بۆ بەرژەوەندی گشتیە باڵاکان بیکەنو نەیانکردوون ئاگاداریان بکاتەوە، چونکە ئەگەر لە بەرانبەر هەر هەڵەو ناتەواویەکی ئەواندا ئەنجامی دەدەن کەمتەرخەمی بکات ئەوا لە بەرانبەر خوداو ئوممەتدا بەرپرسیار دەبێت. بێگومان ئەگەر ئوممەت لەم بوارەدا یارمەتی سەرۆك نەداتو ڕاستیی ڕووداوەکانی پێ ڕانەگەیەنێت ئەوا ئەویش بە تەنها ناتوانێت چاودێری کاربەڕێوەبەرەکانیو کاروبارەکانیان بکات.

٥ـ کۆمەکیکردنو یاریدەدانی: لە هەڵگرتنی باری قورسی بەرژەوەندیەکانی ئوممەت ئەگەر پێویستی کرد، خودای بەرز دەفەرموێت: ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ﴾[1] واتە: لەسەر کاری چاکەو خۆپارێزی هاریکاری یەکتر بکەن، سەرۆکی وڵاتو کابەڕێوەبەرانی دەوڵەت لە هەموو کەس شایانترن هاریکاریان بکرێتو دەستباریان بۆ بگیرێت.[2] ئوممەتیش بە شێوە گشتیەکەی لە بەرانبەر مافەکانی (معاویە)ی ئەمیری ئیمانداراندا و تەواوی خەلیفەکانی دوای ئەو چروکی نەنواندووە، چونکە خەلیفەکان کەمو زۆر شۆڕشیان لە دژ کراون ، بە ئیزنی خودا لە شوێنی خۆیاندا ڕوونیان دەکەینەوە.

## سێیەم: پایەختی دەوڵەتی ئومەویو فەرموودەکانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) سەبارەت بە سەروەریەکانی شام:

(شام) یەکێك بوو لە ویلایەتە هەرە گرنگەکانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی خۆرهەڵات (بیزەنتی)، بەڵکو لەبەر مێژووی کۆنیو هەڵکەوتنی (بەیتولموقەدەس) تیایدا یەکێك بوو لە مەڵبەندە شارستانیەکانی ئەو ئیمپراتۆریەتیە، عەرەبەکانی پێش (ئیسلام)یش بە هۆی شارستانیەتەکەی بە چاوی ڕێزو شکۆو بایەخەوە تەماشایان دەکرد، زیاد لەمەش کە

---

١ المائدة (٢).

٢ رئاسة الدولة في الفقه الاسلامي (ص: ٢٧٠ـ٢٧٤).

ولآتێکی گەورەی پڕ خێروبێربوو و هەمیشە بە باغو بێستانو دەغڵو دانەوێڵەو شیناوەردی ڕازابۆوەو بەرو بازاڕێکی باشیشی لەخۆ گرتبوو، (دیمەشق) بە سەرمەشقی هەموو شارەکانی ولآتی شام دادەنرێت، گەورەترینو بنکەفراوانترین شاریەتیو، ڕۆڵێکی گەورەی لە مێژووی ناوچەکەدا گێڕاوە، هەر لەبەر ئەمە حوکمڕانی ڕۆمانی کردبوویە بنکەی حوکومەتەکەی خۆی، کاتێکیش ئیسلام هاتە نێو (شام) بە گشتیو (دیمەشق) بە تایبەتی، پارێزگاری لێکردو تەواوی والیەکانی پاسەوانیان لە تایبەتمەندیو شوێنەوارەکانی دەکرد، (معاویە) لە ماوەی ویلایەتەکەی خۆیدا بایەخێکی یەجگار زۆری پێدەداو پەیوەندیەکی توندو تۆڵی لەگەڵ دانیشتوانەکەی دروست کرد،[١] ئیدی گرنگی پێگەی هۆزە یەمەنیە نیشتەجێکانی (شام)و (دیمەشق)ی دەرك کردو، خێرا هاوسەرگیری لەگەڵ کیژی یەکێك لە سەرانی ئەو هۆزانە ئەنجامدا کە هۆزی (بەنی کەلب) بوو، لەم هاوسەرەی (یەزید)ی لێکەوتەوە، بەمە پشتیوانیو دۆستایەتی ئەو خێڵانەی بۆ خۆیو بۆ کوڕو خزمو نەوەکانی دوای خۆیشی دابین کرد، شیاوی وتنە: خاڵو خاڵۆزایەتی باشترین هۆکاری تاقم تاقمێنەو گەلەکۆمەیە لەنێو خێڵە عەرەبیەکاندا، زیاد لەمەش زاوابەندیو خەزورایەتی بە هاوپەیمانی سیاسی دادەنرێت لە نێوانیاندا.[٢]

کاتێك (معاویە) لە شامو (دیمەشق)دا پشتی بە هۆزە یەمەنیەکان بەست کارێکی زیرەکانەو ئاقڵانەی ئەنجامدا.[٣] کاتێکیش (دەوڵەتی ئومەوی) دامەزراو قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی ئیسلام بەرەو خۆرهەڵاتو خۆرئاوا کشا،(معاویە) تەماشای کرد شوێنێکی باشترو چاکتری لە (دیمەشق) دەست نەکەوت بیکاتە پایتەختی دەوڵەتەکەی، چونکە دەکەوتە نێوەڕاستی هەردووك بەشی جیهانی ئیسلامی، بەشی خۆرهەڵات: کە (عێراقو فارس)ی لە خۆدەگرتو، بەشی خۆرئاوا: کە (مصرو مەغریب)ی لەخۆ دەگرت، زیاد لەمەش هۆزو خێڵەکانی ئەویّ کە پەیوەندی توندو تۆڵیان لەگەڵ بەستبوو پشتیوانی تەواوی حوکومەتەکەیان بۆ دەکردو ئەزمونو شارەزاییەك کە هەیانبوو لە بواری کاربەڕێوەبردندا پێشکەشیان دەکرد، بە واتایەکی تر هێزێکی سیاسیو سەربازیان لیّ پێکهاتبوو دەوڵەتی

---

١ رجل الإدارة في الدولة الإسلامية العربية (ص: ١٣٥، ١٣٦).

٢ الدولة الإسلامية في العصر العباسي (ص: ٤٢).

٣ المصدر نفسه (ص: ٤٢).

ئومەویش بە تەواوەتی پشتی پێ بەستبوون،[١] لە لایەكی ترەوە (شـام‌و دیمەشـق)كلتـورێكی ڕەسەنی لە بواری حوكمڕانیـدا تێـدا بـەجێمابوو، بەمـەش (معاویـە) بەسـەر دامودەزگایـەكی خاوەن ئەزموون‌و شارەزاو ڕاهاتوی بەجێماوی ئیدارەی دەوڵەتی بێزەنتی دا كەوت، كە توانی لە دامەزراندنی بنەماو پایەكانی (دەوڵەتی ئومەوی)یداو وەرچەرخاندنی بەردەوامیـدا سـودی لێ ببینێت، دەبێت ئەوەش بە هەند هەڵبگرین كە ئەوەندەی شام پشك‌و بەشی شارستانیەتی بەركەوتبوو وڵاتانی تری ناوچەكە ئەوەنـدەیان بەرنەكـەوتبوو، ئـەو هـۆزو خێڵـە عەرەبانـەی پـێش فـەتحكران بـەرەو شـام كۆچـیان كردبـوو و تێیـدا نیـشتەجێ ببـوون، خوویـان بـە بیروبۆچوونی حـوكمی ناوەنـدی بـە تایبـەتی‌و دەوڵەتـداری بـە شـێوەیەكی گشتی گرتبـووو لەگەڵی ڕاهاتبوون، بە پێچەوانەوە عەرەبەكانی تری وەكو (عێراق) ئـەم بیروبۆچـوونەیان بـە ئاسانی وەرنەدەگرت‌و پێیەوە پابەند نەدەبوون، ئەمـە بەسـەر تـەواوی دانیـشتوانی عێراقـی پێش فەتح‌و دوای فەتحدا دەچەسپا، ئەوانەی لە پـێش فـەتحی ئیـسلامدا نیشتەجێی عێـراق ببوون دوژمنایەتی‌و ململانێیەكی درێژخایەنیان لەگەڵ (حوكمی فارسی)یدا هەبوو.[٢]

هەرچی دانیشتوانی وڵاتی (شام)یش بوو، لەگەڵ (حوكمی بێزەنتی)یدا خـۆی گونجانـدبوو پابەندو گەرنكەچـی قانونـەكانی بـوو، ئـەو (عـەرەب)انـەش كـە لـە دوای فـەتح بـەرەو شـام كۆچیان كردو لەوێ نیشتەجێ بوون وەكو عەرەبەكانی (بەصرەو كوفە)ی عێراق نەبوون‌و لە سەربازگەی تایبەتدا نەدەژیان، بەڵكو لەگـەڵ دانیـشتوانە ڕەسـەنەكەی شـام تێكـەڵ بـوون‌و ئەوان لە كوێ دەژیـان ئـەمانیش بـە هاوسـێیایەتی ئـەوان دەیانگوزەرانـد، ئـەم تێكەڵبوونـە ڕەنگی هەڵگەڕانەوەی تایەفەگەری لەلای ئەوان كاڵ كردەوە.[٣]

(معاویە) دوای بوونی بە والی دەستی بە كۆكردنەوەو ڕێكخستن‌و مەشقپێكردن‌و ڕاهێنـانی (سوپای شـام) كـردو، دوای ئـەوەش كـە بـوو بـە (خـەلیفـە) موچـەی باشـی بـۆ یەكەیەكـەی سەربازانی سوپاكەی بڕیەوەو لە پێناوی بەدەستهێنانی دڵسۆزی‌و ڕەزامەنـدی ئـەوان هـەموو ڕێبازو شێوازێكی لـە بـاری گرتەبـەرو، كۆبوونـەوەو پەیوەندیـە دیبلۆماسیەكانیـشی لەگـەڵ ئیمپراتۆریەتی (بێزەنتی)یـدا لـە دەریـاو وشـكانیەوە یاریـدەی سـوپای شـامی دا پـشوویەك

---

١ رجل الإدارة في الدولة الإسلامية العربية (ص: ١٣٦).

٢ تاريخ خلافة بني أمية، نبيه عاقل (ص: ٦٢).

٣ المصدر نفسه (ص: ٦٢)، الجذور التاريخية للأسرة الاموية، د. إحسان صدقي العمر (١/٢٣، ٢٥).

بداتو دەرفەتێکی زۆریش بۆ ڕاهێنانو مەشقپێکردنی بقۆزێتەوەو شارەزاییەکی باش بە دەست بێنێ، ئەم (سوپای شام)ە کە دەستپەروەردەی خودی (معاویە) بوو، یارمەتیەکی باشی (معاویە)ی دا لە بەدەستهێنانی سەرکەوتنەکانی لە دەرەوەی جیهانی ئیسلامدا.[1]

لە لایەکی ترەوە فەرموودەکانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) کاریگەریەکی گەورەیان لەسەر خەڵك دانا تا بەرەو شام کۆچ بکەنو خۆ بە ئیسلامەکەیانەوە هەڵبکێشنو داکۆکی لەسەر سەرکردایەتیکردنی جیهان بکەنەوە، پێغەمبەر (ﷺ) خەڵکی شامی لە خەڵکانی تر هەڵاواردووە کە ئەوان تا کۆتایی زەمان فەرمانی خودا بەرپا دەکەنو کۆمەڵەی سەرکەوتوو (الطائفة المنصورة) لەوان دەبێت، تا دنیا خەراپ دەبێت ئەم سیفەتەیان تێدا بەردەوام دەبێتو هەر زۆرو بەهێز دەبن.[2]

(معاویە) ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خودا (ﷺ)ی دەکردە بەڵگەی پەسندکرانی خەڵکی شام: ((لا تزال طائفة من أمتي قائمة بأمر الله، لا يضرهم من خالفهم ولا من خذلهم، حتى تقوم الساعة))[3] واتە: بەردەوام تا قیامەت هەڵدەسێت کۆمەڵێك لە ئۆممەتەکەم بەرپاکەری فەرمانو حوکمی خودان، هەر کەسو گروهێك دژایەتیان بکاتو بیەوێت شکستیان بەسەر بێنێت زیانیان لێ نادات.

(مالکی کوڕی یخامر) هەستایە سەرپاو وتی: کە ئەو گوێی لە (مەعاذ) بووە دەیوت: ئەو کۆمەڵە لە شامە، ((معاویە) وتی: ئەوە (مالیکی کوڕی یوخامیر)ە، دەڵێت: کە ئەو گوێی لە (مەعاذ) بووەو وتوویەتی: ئەو کۆمەڵە لە (شام)ە[4]، (موسلیم) لە (ئەبو هورەیرە)وە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((لا يزال أهل الغرب ظاهرين))[5] واتە: هەمیشە خەڵکی خۆرئاوا سەرکەوتوون. ئیمام ئەحمەد دەڵێت: خۆرئاوا دانیشتوانی شامن،[6] چونکە پێغەمبەر (ﷺ) لە (مەدینە) نیشتەجێ بوو، چ شوێنێك کەوتبێتە خۆرئاوای (مەدینە)وە ئەوە خۆرئاوای پێغەمبەر (ﷺ)یش بووە، چ شوێنێکیش کەوتبێتە خۆرهەڵاتی مەدینەوە

---

١ رجال الإدارة في الدولة الإسلامية العربية (ص ١٣٦).

٢ الفتاوى (٤/٢٧٥).

٣ البخاري رقم (٢٧٣١١)، مسلم رقم (١٩٢٠، ١٩٢١).

٤ الفتاوى (٤/٢٧٣)، (إبن حبان) ناوی (مالکی کوڕی یخامرة)ی لە ڕیزی (الثقات)دا هێناوە، تهذيب التهذيب (١/ ٢٣، ٢٥).

٥ مسلم في الامارة.

٦ الفتاوى (٤/٢٧٣).

ئەوە خۆرهەلاتی پێغەمبەر (ﷺ)یش بووە[١].... پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵیدا کە (کۆمەڵە لەسەر هەقو سەرکەوتووەکە)ی ئوممەتەکەی لە خۆرئاوا دەبن کە (شام)و هەموو ئەو شوێنانەن کە دەکەونە خۆرئاوای (مەدینە)وە، دانیشتوانی (مەدینە) بە دانیشتوانی (شام)یان دەوت: (خەڵکی خۆرئاوا)، سەبارەت بە (ئیمام ئەوزاعی) دەڵێن: پێشەوای خەڵکی خۆرئاوا.[٢] کاتێك دەقەکان دەبنە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە ئەو (کۆمەڵە لەسەر هەقو سەرکەوتووە)ی دوژمنانو نەیاران ناتوانن زیانی پێ بگەیەنن و شکستی دەرخوارد بدەن لە (شام) دەبن، ئەوا لە ڕاستیدا ئەو دەقانە هیچ دژایەتیەکیان نیە لەگەڵ ئەم فەرموودانەی تردا: ((تقتل عماراً الفئة الباغية))[٣] واتە: تاقمە یاخی بووەکە (عەممار) دەکوژێت. یان کە دەربارەی (خەواریج) دەفەرمووێت: ((تقتلهم أولى الطائفتين بالحق))[٤] واتە: لەنێو دوو کۆمەڵەکەدا کامەیان لە هەقەوە نزیکترە ئەوەیان بەرەنگاریان دەبێت ودەیانکوژێت. بێگومان دەبێت ئەم فەرموودانە لەگەڵ یەکتردا کۆبکرێنەوەو گونجانیان لەنێواندا بکرێت، دەوترێت: ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ): ((لا يزال أهل الغرب ظاهرين))[٥] واتە: هەمیشە خەڵکی خۆرئاوا سەرکەوتوون و چەند فەرموودەیەکی تری وێنەی ئەمەش کە دەری دەخەن خەڵکی شام سەرکەوتوون، ئەمە ئەمری واقیعەو بەردەوام ئەوان سەردەکەون.[٦] بەڵام سەبارەت بەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ): ((لا تزال طائفة من أمتي قائمة بأمر الله))[٧] واتە: هەمیشە کۆمەڵێکی نێو ئوممەتەکەم بەرپاکەری حوکمی خودایەو ڕایدەپەڕێنێت، لەگەڵ ئەمەدا فەرموودەکە ئەو ڕاستیەی لێ دەفامرێتەوە بەڵام ئەوە ناخوازێت کە ئەوان هەرگیز یاخیان تێدا پەیدا نابنو لە بازنەی دەرەوەی ئەوانیش کەسانێك نابن لە هەقەوە نزیکتر بن، بەڵکو دەگونجێت ئەمەشی تێدا بێتو ئەوەش هەبێت.[٨] بەڵام کە دەفەرمووێت: ((تقتلهم أولى الطائفتين بالحق)) واتە: کام تاقمە لەنێو دوو تاقمەکەدا لە هەقەوە نزیکتر بێت ئەوە

---

١ الفتاوى (٤/٢٧٤).
٢ الفتاوى (٤/٢٧٣).
٣ البخاري، رقم (٤٤٧).
٤ مسلم، باب الزكاة.
٥ مسلم باب الإمارة.
٦ الفتاوى (٤/٤٧٤).
٧ البخاري، رقم (٧٣١١).
٨ الفتاوى (٤/٢٧٤).

دەیانکوژێت، بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە لەو کاتەدا (عەلی)و خەڵکانی گەلی لە هەقەوە نزیکتربوون، خۆ ئەگەر ئەو کەسو تاقمە لە هەندێك حاڵەتدا بە قەد خەڵکانی تر لە هەقەوە نزیك نەبن ، ئەوا ئەوە ڕێی بەردەم راپەراندنی حوکمی خودایان لێ ناگرێت، یان نابێتە ڕێگر لەبەردەمیاندا تا بە گوێڕایەڵیو فەرمانبەرداری خوداو پێغەمبەر (ﷺ)ەوە خۆ بەدەربخەن، دەبێت کردارەکەی ئەوان فەرمانبەرداری بێت، بەڵام کرداری بەرانبەرەکەیان لە هی ئەوان پەسندتر بێت، بەڵام سەبارەت بە ئەمە کە لە هەندێك کاتدا هەندێکیان یاخی دەبن، دەگونجێت یاخی بوونەکە گوناهێکی چاوپۆشیلێکراو بێتو هەڵەیەکی لێبوردراو بێت، بە هەمان شێوە شایەتیدانی دەقەکان ڕێگر نین لەبەردەم دەرکەوتنی گوناهانێکی لەم جۆرەپێیانەوە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) بە شێوەیەکی گشتی باسی ڕێزو شکۆی خەڵکی (شام)ی کردووە ،بێگومان شێوە گشتیەکە بەسەر حاڵەتە تایبەتو تاکو تەراکاندا پەسند دەکرێت.[1]

(عومەری کوڕی خەتاب) (خودا لێی ڕازی بێت) لە ماوەی خیلافەتەکەی خۆیدا بەسەر خەڵکی عێراقیدا هەڵدەبژاردن، تا ئەوەی چەند جار سەردانی (شام)ی کرد، بەڵام بۆ جارێکیش ڕووی لە (عێراق) نەکرد، پرسی کرد کە بچێت بەڵام پێیان وت کە نەچێت، لە کاتی سەرەمەرگیدا: دانیشتوانی مەدینە بە حوکمی ئەوە ئەوان لەو کاتەدا باشترین چینی ئوممەت بوون، یەکەم جار ئەوان ڕێیان پێ درا بچنە لای، ئەمجا خەڵکی شام، ئەمجا خەڵکی عێراق، دواهەمین خەڵك بوون سەردانیان کرد.[2]

(ئەبوبەکری صدیق)یش (خودا لێی ڕازی بێت) گرنگی زیاتری بە فەتحکردنی (شام) دەدا لە (عێراق)، تا ئەوەی وتبووی: بە خودا فەتحکردنی گوندێك لە گوندەکانی شامم بە لاوە خۆشترە لە فەتحکردنی شارێك لە شارەکانی عێراق.[3]

ئەم دەقانەی لە قورئانو سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ)و شوێنەواری هاوەڵاندا سەبارەت بە هەڵبژاردنی (خەڵکی شامو خۆرئاوا) بەسەر خەڵکانی (نەجد)و (عێراق)و تەواوی خەڵکانی (خۆرهەڵات)دا هاتوون، زۆر زۆرترن لەوەی کە لە شوێنێکی ئاواو بەرتەسکدا باس بکرێن، بەڵکو دەقی صەحیح زۆرن لەسەر زەمبی خەڵکی خۆرهەڵاتو پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی داوە

---

١ الفتاوى (٤/٢٧٤).
٢ الفتاوى (٤/٢٧٥).
٣ الفتاوى (٤/٢٧٥).

کە ئاشوب‌و سەری کوفر لەوێوە سەردەردێنێت، بەڵام ئێرە جێی ئەم باسە نیە، بێگومان لە سەردەمێکدا خەڵکی خۆرهەڵات لە خەڵکی تر پایەدارتر بوون، ئەمە بە هۆی بوونی (عەلی)ی ئەمیری ئیماندارانەوە بوو لە ئەوێ، بەڵام کاتێك بوو و بەسەرچوو، چونکە بە وەفاتی (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) هەموو جۆرەکانی (ئاشوب‌و دووڕوویی‌و هەڵگەڕانەوەو بیدعە) سەریان هەڵدا، بەمە زانرا کە دەبێت ئەوانە (واتە خەڵکی شام) بەسەر ئەمانە (واتە خەڵکی عێراق)دا پەسند بکرێن،[1] هەروەها هیچ گومانی تێدا نیە کە عێراق کەسانی هێند زاناو صالح‌و دیارو بەرچاوی تێدابوون کە بە چەند قات لە کەسایەتیە بەرزەکانی شام باشترو پایەدارتر بوون، وەکو: (عەلی‌و عبداللە ی کوڕی مسعودو حوزەیفەو عەممارو هاوێنەکانیان) ، ئەمانە هەر هەموویان لە هاوەڵە بەڕێزە نیشتەجێکانی شام چاکتر بوون، بەڵام بەراوردکردن‌و بەرانبەرپێکردنی گشتیانە هەردوولاو پەسندکردنی لایەکیان ڕێگری ناکات لە بەرانبەر تایبەتمەندکردنی کۆمەڵێکی تر بە هۆی سیفاتگەلێکەوە کە هەڵیاندەبژێرێت‌و ئیمتیازیان پێ دەدات، لێرەداو لەگەڵ ئەمەشدا کە (عەلی) لەوکۆمەڵەی لەژێرفەرمانی دەرچوون و لێی جودا بوونەوە بۆ هەق لە پێشتربوو و (عەممار)یش بە پێی دەقە صەحیحەکان لە لایەن کۆمەڵە یاخی بووەکەوە دەکوژرێت، بەڵام لە هەندێك ڕووەوە پەسندکرانی خەڵکی (شام)مان بۆ ڕوون دەبێتەوە، جا واجبە لەسەرمان: باوەڕ بە هەموو ئەو دەقانە بکەین کە لە لایەن خوداوە هاتوون‌و دان بە هەموو ڕوویەکی (هەق)دا بێنین‌و هەوای کەللە نەمانگرێت‌و بەبێ بەڵگەی زانستیانە قسە نەکەین، بەڵکو دەبێت ڕێبازی زانستیانەو دادپەروەرانە بگرینەبەر، کە خۆی لە شوێنکەوتنی ڕاست‌و دروستی (قورئان‌و سوننەت)دا دەبینێتەوە، بەڵام ئەوەی سەرچاوەی ناکۆکی‌و جیاوازی بێت ئەمەیە یەکێك بێت‌و دەست بە لایەنێکی هەقەوە بگرێت‌و لایەنەکانی تری فەرامۆش بکات.[2]

## چوارەم: ئەهلی ( حەل‌و عەقد ) لە سەردەمی ( معاویە )دا ( خودا لێی ڕازی بێت ):

کۆمەڵگای ئیسلامی لە سەردەمی (خیلافەتی ڕاشیدە)دا بە خێرایی پەرەی دەسەند، بە جۆرێك هەرەشەی لە پاراستنی نیشانە بنەڕەتیەکانی ئەو حکومەتە دەکرد کە ڕەنگدانەوەی خۆشەویستی‌و پێکەوەسازان‌و لەسەریەك بە جوابهاتنی دوو سەرەی نێوان خەلیفەو

---

١ الفتاوی (٤/٢٧٥).

٢ الفتاوی (٤/٢٧٥).

ڕەعیەتو ترسان لە خودا بوو، ترسناكی ئەم گەشەسەندنە لەوەدا دەردەكەوت: كە بەرەبەرە ڕۆڵی ئەندامانی (حەللو عەقد)ی نیشتەجێی شاری (مەدینە)، بە مردنی زۆربەیانو بڵاوبوونەوەی هەندێكی تریان بە شارو وڵاتە تازە فەتحكراوەكاندا كەم بووەوە، لە ئەنجامی سەركەوتنە گەورەكانی بزووتنەوەی فتوحاتی ئیسلامیدا شارو وڵاتە تازە فەتحكراوەكان جێگەو پێگەی سیاسیو سەربازیو ئیدارییان لە جێگەوپێگەی وڵاتی (حیجاز)ی مەڵبەندی (خیلافەت) بەزرتر بووەو (كۆمەڵگای ئیسلامی)یش دەوڵەمەندیو خۆشگوزەرانیەكی وای بەخۆوە بینی كە تا ئەو كاتە بە خۆیەوە نەدیبوو، ئیتر بە هۆی ئەمەوە گۆڕان بەسەر دەروونو ڕەوشتی هەندێك خەڵكیدا هات.[1] بەرەبەرە هەندێك چەمكو واتای وەكو چەمكی (حەللو عەقد) گۆڕانیان بەسەردا هات، ئەوان بۆ هەڵبژێرنی گرفتەكان نەدەچوون بۆ مەدینە پرس بە ئەهلی (بەدر) یان كۆمەڵی (سابقین) بكەن، ئەمانیش بە تێپەڕینی زەمان ژمارەیان كەم بۆوە، لەم نێوانەدا سەرۆكی شارو وڵاتەكان بە تایبەتی سەرۆكانی شام هاتنە گۆڕەپانی سیاسییەوەو كاریگەری لەسەر مەسەلە هەستیارەكان دادەنا.

كاتێك كە لە نێو ڕووداوە مێژووییەكان قوڵ دەبینەوە نیشانمان دەدەن كە خەڵكی (مەدینە) لە بەرانبەر بارودۆخەكاندا دەستەوستان ڕاوەستاونو خەڵكانی شارەكانی تریش بەوپەڕی تواناو دەسەڵاتەوە مەسەلە سیاسیەكان هەڵدەبڕن، ئەمجا جەخت دەكەنەوە لەسەر یەكپارچەییو گوێڕایەڵیو فەرمانبەرداری تەواوی خەڵكی شام بۆ بڕیارەكانی دەوڵەتو خۆڕاهێنان لەسەر شێوازەكانی ئیدارەو شارستانیەت، بە هۆی ئەم ئامادەسازیەو سیفەتانەیانەوە وڵاتەكەی خۆیان پێش عێراقو تەواوی وڵاتە ئیسلامیەكانی تر خستو كار بەوە گەیشت بەیعەتیان دا بە (معاویە)، ئەمجا دەوڵەتی ئومەوی توانی بۆ ماوەی زیاتر لە نەوەت ساڵی تەمەنی پارێزگاری لە تواناو وزەكانی خۆی بكات، ئەمە دەری دەخات كە سەركردەكانی ئەو وڵاتە بە حوكمی واقیعی سیاسی ئە سەردەمە ببوونە ئەمری واقیع و وەكو گەورەترینو دیاترین ئەندامی (ئەهلی حەللو عەقد)خۆ دەربخەن وتوانیویانە (خەلیفە) هەڵبژێرنو بە خۆشی یان بە ناخۆشی قەناعەت بە تەواوی كۆمەڵگای وڵاتانی دوورو نزیك بكەن ،لە ئاوەكۆمەڵگایەدا كە هەستوهەواو تەماعی ڕەگەزە زۆرو لێكجیاوازەكان حوكمی بەسەردا دەكرد .

**١ـ ڕاوبۆچوونی شەرعزانان سەبارەت بە واتای (ئەهلی حەللو عەقد):**

---

١ الدولة والمجتمع في العصر الأموي (ص: ١٢٧).

کاتێك بمانەوێت پشت بە وتەی زانایانمان ببەستین سەبارەت بە واتای (ئەهلی حەللو عەقد)، دەبینین چەند قسەیەکی لێك جیاواز دەکەنو[١] ژمارەیەك زاراوە باس دەکەن، لە نێوانیاندا:

أ‌- (أولوالأمر)= فەرمان بە دەستان، سەرپەرشتیارانی کاروبار، ئەمە زاراوەیەکی شەرعیەو قورئانی پیرۆز بە (دەق) هێناویەتی، خودای بەرز دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ﴾[٢] واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە، فەرمانبەرداری خودا بکەن، فەرمانبەرداری پێغەمبەرو فەرمانبەدەستانی نێو خۆتان بکەن، سەبارەت بەوە کە مەبەست لە (أولي الأمر) چیە چەند قسەیەکیان کردوون، هەرە بەناوبانگەکانیان ئەمانەن:

- ئەمیرو کاربەدەستان، ئیمام (الطبري) پەسەندی کردووە،[٣] (نووی) دەڵێت ئەمە وتەی جەماوەری پێشینو پاشینی زانایانە.[٤]

- شەرعزانانن: ئەمە وتەی هەندێك لە زانایانی پێشینە، وەکو: جابری کوڕی عبدالله، حەسەنی بەصری، نەخەعیو هی تریش.

- هاوەڵانی محمد (ﷺ)ن.

- (أبوبکرو عمر)ن.

- وشەیەکی گشتگیرەو هەموو فەرمانبەدەستو زانایان لەخۆ دەگرێت، ئیمامان: إبن کثیر[٥] و إبن القیم[٦] و الشوکاني[٧] و هەندێکی تریش ئەمە پەسەند دەکەن.

- زانایانو ئەمیرانو سەرۆکانو هەر کەسێکیش کۆمەڵە خەڵکێکی دواکەوتبێت دەگرێتەوە، ئەمە ڕای (ابن تیمیە)و[٨] (محمد عبدە)[٩]یەو دەڵێت: ئەوانە ئەهلی حەللو

---

١ المصدر نفسه (ص: ١٢٨).

٢ النساء (٥٩).

٣ تفسير الطبري (٥٠٢/٨).

٤ شرح النووي على صحيح مسلم (٢٢٣/١٢).

٥ تفسير ابن كثير (٥٣٠/١).

٦ الرسالة التبوعية (ص: ٤١٠).

٧ فتح القدير (٤٨١/١).

٨ الحسبة (ص: ١٨٥).

٩ تفسير المنار (١٨١/٥).

عەقدن،[١] لەوانەیە ڕای پێنجەمو شەشەم کە زۆر لێك جیاواز نین بەسەر ڕایەکانی تردا پەسەند بکرێن.[٢]

ب ـ (العلماء)= زانایان: لێرەدا مەبەست لە (زانایانی بواری شەریعەت)ە، ئەمە وشەیەکی قورئانییە، خوای پاكو بەرز دەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟﴾[٣] واتە: تەنها زانایان لە خودا دەترسن. جار هەیە بە دەربڕینی (أولوالعلم) دێت، وەکو خوای بەرز دەفەرمووێت: ﴿شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَأُو۟لُوا۟ ٱلْعِلْمِ قَآئِمًۢا بِٱلْقِسْطِ﴾[٤] واتە: خوداو فریشتەکانو زانایان شایەدی دەدەن کە جگە لە (الله) هیچ پەرستراوێکی تری بە هەق نیەو دادپەروەریش بەرپا دەکات. هەر ئەم زاراوەیە هێندە لە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ)دا هاتووە کە لە ژمار نایەت، پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێت: ((إن الله لا يقبض العلم إنتزاعا ينتزعه من الناس، ولكن بموت العلماء))[٥] واتە: خودا بە شێوەی ڕاکێشانو سەندنەوەی ڕاستەوخۆ زانست لە خەڵك ناسێنێتەوەو بۆ لای خۆی ناگێڕێتەوە، بەڵکو بە مەرگی زانایان.

ج ـ (أهل الاختيار)= خەڵکانی هەڵبژێرەر، ئەو کەسانەن کە (ئیمام) کاری هەڵبژاردنی (ئیمام)و بەیعەتدان بە (ئیمام)یان پێ دەسپێرێت، ئەوانە ئەهلی حەللو عەقدن.[٦] هەروەها زاراوێکی (ئیجتیهادی)یەو هەندێك لە زانایان ناوی دەبەن.[٧]

د ـ (أهل الاجتهاد)= ئیجتیهادکەران: بریتین لەو زانایانەی لە شەریعەتی ئیسلامیدا گەیشتوونەتە پلەی ئیجتیهادو فتوادانو دەشتوانن کاروباری گەورەو گرنگی وەکو: ئیمامەتی کوبرا (سەرۆکایەتی گشتی)و دادوەریو فتواو وێنەی ئەم کارانە بەڕێوە بەرن، (البغدادي)و[٨] (قرطبي)[٩] لەنێو ئەو زانایانەدان کە ئەم زاراوەیان خستووەتەڕوو.

---

١ أهل الحل والعقد، عبدالله الطريقي (ص: ١٢).
٢ المصدر نفسه.
٣ فاطر (٢٨).
٤ ال عمران (١٨).
٥ مسلم، رقم (١٣).
٦ الموسوعة الفقهية الكويتية (٧/١١٥).
٧ أهل الحل والعقد، عبدالله الطريقي (ص: ١٣).
٨ المصدر نفسه (ص: ١٣)، أصول الدين (٢٧٩).
٩ تفسير القرطبي (١/٢٦٥).

هـ ـ (أهل الشورى)= دەستەی ڕاوێژکار: ئەو کەسانەن سەبارەت بە کاروباری موسڵمانان ڕاوێژ دەکەن‌و پرس‌و ڕا دەگۆڕنەوە، بە پێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: ﴿وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِ﴾[1] واتە: لە تەگبیرو بەڕێوەبردنی کاروباردا ڕاوێژیان پێ بکە، هەروەها ئەم ئایەتە پیرۆزە: ﴿وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ﴾[2] واتە: کاروباری موسڵمانان بە ڕاوێژو تەگبیری نێوخۆیان بەڕێوە دەچێ.

و ـ (أهل الشوكة)= دەستڕۆیشتوان: بریتین لە دەسەڵاتدارو خەڵکی قسە بەدەست‌و دەست ڕۆیشتوو و بە زەبرو زەنگەکانی نێو ئوممەت، (ابن تيمية)[3] ئەم زاراوەی بەکارهێناوە.

ز ـ (أهل الرأي والتدبير)= قسەبەدەست‌و تەگبیرکەران: بریتین لەو کەسانەی بە ئاوەزو بیرو زەینی ڕوون‌و پێگەیشتوو و توانای تەواو و بەسەرڕاگەیشتنی کاروبارەکان ناسراون، (إبن عابدين)[4] یەکێکە لەو زانایانەی ئەم زاراوەی بەکارهێناوە.

کەواتە (ئەهلی حەلل‌و عەقد) بریتیە لەو لیژنە قسەبەدەست‌و دەستڕۆیشتووەی نێو ئوممەت کە دەتوانێت موسڵمانان لە یەك بازنەدا کۆبکاتەوەو سیستەمە گشتی‌و تایبەتیەکانی کاروباری سیاسی‌و ئیداری‌و یاسادانان‌و دادوەری‌و... هتدیان بۆ دامەزرێنێت‌و ئەمجا بە هۆی چەند هۆکارێکی تایبەتەوە هەریەکێك لەم دەزگایانە هەڵدەوەشێنێتەوەو سەرلەنوێ دایدەمەزرێنێتەوە.[5]

وەکو دەردەکەوێت (ئەهلی حەلل‌و عەقد)ی سەردەمی (معاویە) بریتی بوون لە (والیەکان‌و سەرکردەکانی سوپاو سەرۆك هۆزەکان‌و هاوشێوەی ئەمانە)، هێزو دەسەڵاتی فیعلی لە خەڵکی شامدا چڕ ببۆوە، بە جۆرێك ئەوان دەیانتوانی هەڵبژێرن‌و خواستی خۆیان بەدەست بهێنن‌و ویستەکانیان بەسەر پێچەوانەکانیاندا بسەپێنن، ئەمە ئەوەبوو کە لەو سەردەمە مێژووەی خەڵکی شامدا هاتەدی، ئەگەر بە ویژدانەوە مەسەلەکە هەڵسەنگێنین دەڵێین: پێویست بوو بازنەی (ئەهلی حەلل‌و عەقد)ەکە بەرفراوانتر کرابایەو لە پەنا سەرانی

---

١ ال عمران (١٥٩).

٢ الشورى (٣٨).

٣ منهاج السنة (١/٥٥٠).

٤ حاشية ابن عابدين (٤/٢٦٣).

٥ أهل الحل والعقد (ص: ١٥).

شامدا سەرانی تەواوی وڵاتە ئیسلامیەکانی تری وەکو (عێراقو حیجازو میصرو هی تریش)ی لەخۆ گرتبایەو لە پەنا خەڵکانی بە دەسەڵاتی عەشایری خەڵکانی شەرعزانو دینداری خاوەن تەگبیرو ڕای ئوممەتیشی لەخۆ گرتبایەو، وێڕای هەڵبژینی مەسەلە چارەسەرسازو گرنگەکانی ژیانی ئوممەت دەسەڵاتی هەڵبژاردنو لێخستنی (خەلیفە)شیان پێدرابایە، ئەگەر ئەمە لە کاروانەکەی دەوڵەتی ئومەویدا جێبەجێ کرابایە خوێنڕێژیو ناکۆکی لە ئوممەت دوور دەخرایەوە، بەڵام ئەوەی بە کردەوە ڕوویدا: خەڵکی شام لیژنەی (ئەهلی حەللو عەقد)یان لەسەر خۆیان قۆرغ کردو ئەوان بە تەنها لە سەردەمی ئومەویدا دەیانتوانی (خەلیفە) لە خودی بنەماڵەی (ئومەوی)دا هەڵبژێرن، سەرەتای ئەمە بە بەیعەتی (یەزیدی کوڕی معاویە)وە دەستی پێکرد کاتێك باوکی (ویلایەتی عەهد)ی بۆ بڕیاردا، دوای قەومانی چەند کارەساتێك بەدواداهاتنی خەلیفەکان لە بنەماڵەی (ئومەوی) بوو بە ئەمری واقیع، جا ئیدی وڵاتانی تر پێیان خۆش بووبێت یان پێیان ناخۆش بووبێت.[1]

لەمەولا بە ئیزنی خودا قسە لەسەر بابەتی (ویلایەتی عەهد) دەکەین.

## پێنجەم: ڕاوێژ لە سەردەمی (معاویە)دا (خودا لێی ڕازی بێت):

کاتێك (خیلافەت) بەرەو بنەماڵەی (ئومەوی) گوازرایەوە، (معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان) لە بەرانبەر سوودەکانی ڕاوێژدا نادیدە نەبوو، بۆیە فەرامۆشی نەدەکردو هیچ کارێکی گەورەو گرانی بەبێ پرسو ڕای دەوروبەری تێنەدەپەڕاند، ئەو ڕاوێژی بە والیەکانیو کەسە دیارەکانی نێو خەڵكو پیاوماقوڵانی نێو هۆزەکانو زانایان دەکرد، ئیدی تەواوی خەلیفە ئومەویەکانی دوای خۆیشی لەم بوارەدا شوێن پێی ئەویان هەڵگرتبوو، (عەمروی کوڕی عاص)و (موغیرەی کوڕی شوعبە) دوو گەورە ڕاوێژکاری نێو ڕاوێژکارەکانی (معاویە) بوونو ڕای هەموو ئەو وەفدانەشی وەردەگرت کە لەمسەروسەری جیهانی ئیسلامەوە دەهاتنە لای.[2]

خەڵك بەوپەڕی سەربەستیەوە قسەیان دەکردنو ڕاوبۆچوونی خۆیان دەردەبڕیو (خەلیفە)ش گرنگی زۆری بەو ڕایانە دەداو گفتوگۆی لەگەڵ دەکردنو هەوڵی دەدا ساغیان بکاتەوەو، بۆ حوکم لەسەردانیان پشتی بە ڕاوێژکارانێکی تایبەتی لێوەشاوەو کاتیبانێکی بە توانا دەبەست، دەستی ئەم ڕاوێژکارو کاتیبانەی بۆ کارکردن ئاوەڵاکردبوو، متمانەی تەواوی لەسەر هەبوونو بە دەزگای سەڵتەنەتەکەی خۆیەوە پەیوەست کردبوون، حوکمەت لە

---

١ الدولة والمجتمع في العصر الأموي (ص: ١٢٨).

٢ في تاريخ الحضارة العربية الإسلامية (ص: ٥٥).

شەخسی (خەلیفە)دا چەقی نەبەستبوو، بەڵکو بە حوکمی بەرفراوانی مەملەکەتەکەی خودی خۆی بەسەر هەموو کاروبارەکان ڕانەدەگەیشت، والی بەسەر هەرێمەکانەوە دادەنان‌و ئازادی تەواوی پێ دەدان تا بە خۆیان کاروبارەکان ڕاپەڕێنن، ئەو کەسێکی نەدەکرد بە والی متمانەی تەواوی لەسەر نەبووایەو دەسەلاتی نەدەدا بە کەسێك مەترسی لێ کردبایە.[١] لە سنوورێکی دیاریکراودا پرسی بە والیەکانی دەکرد، (کاروباری خیلافەت)یش لە بنەماڵەی (ئومەوی)دا کورت هەڵێنرابوو و کرابووە شتێکی تایبەتی ئەوان‌و بە کۆبوونەوەی مەحرەمانەی کەسە دیارەکانی نێو خودی بنەماڵە پرسوڕای لەسەر ئەنجام دەدرا، خەلیفەکانی ئومەوی لە زۆربەی کات‌و بارودۆخەکاندا بۆ ڕاوێژکردن لەسەر دانانی خەلیفەو بەڕێەرچدانەوەی تەماعکارانی ئەم پۆستە پەیوەندیان بە تایەفەکانی نێو بنەماڵەوە دەکرد.[٢]

لێرەدا دەکرێت بڵێین لە سەردەمی (ئومەوی)دا دوو جۆرە ڕاوێژ هەبووە: یەکەمیان: پەیوەندی بە کاروبارو بەرژەوەندە گشتیەکانەوە هەبووە، خەلیفەکانی (ئومەوی) لەم بوارەدا ڕاوێژیان لەگەڵ والیەکان‌و پیاو ماقوڵانی هۆزەکان‌و خەڵکی بیرتیژو ئاقڵمەند ئەنجام دەدا. دووەم: ڕاوێژێکی تایبەت‌و پەیوەست بە سەڵتەنەتەوە بوو، خەلیفەکانی (ئومەوی) لەم بوارەدا کۆبوونەوەو پرسوڕای مەحرەمانەیان لە نێو ئەندامانی خودی بنەماڵەکەیاندا ئەنجام دەدا.[٣]

سەرکردایەتی (معاویە) سەرکردایەتیەکی تەواو تاکڕەوانە نەبوو، زیاتر سیستەمی لامەرکەزی لە حوکمەتەکەیدا ڕەنگی دەدایەوە، بە خاتری هەڵگرتنی باری بەرپرسیاری‌و ڕاپەڕاندنی کاروبارەکانی دەوڵەت لە ناوەندو ویلایەتەکانداو لە هەردووك کاتی ئاشتی‌و جەنگدا بەشداری بە پیاوانی شارەزاو خاوەن بیروڕای پەسەند دەکرد.

لە ڕاستیدا بوونی ئیسلام لە ژیانی تاك‌و کۆمەڵ‌و دەوڵەت‌و سیستەمی حوکمڕانیدا هەر لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)و خەلیفە ڕاشیدەکانەوە، لە دیاردەی سەرکردایەتیکردنی تاکڕەوانەو شتە خراپەکانی کەم دەکاتەوەو لە هەموو بوارەکانی سیاسەت‌و سەرکردایەتیکردن‌و کاربەڕێوەبردن‌و ئاڵوگۆڕپێکردنی کاروبارەکان‌و چاودێریکردنی بەرژەوەندیەکاندا پشتگیری لە دیاردەی ڕاوێژو زاڵکردنی ئاراستەی گشتی دەکات.[٤]

---

١ الدولة الأموية، يوسف العشي (ص: ١٣٩).

٢ في تاريخ الحضارة العربية الإسلامية (ص: ٥٦).

٣ المصدر نفسه (ص: ٥٧).

٤ دراسة في تاريخ الخلفاء الأمويين (ص: ١٠٢).

وەرگێڕانی خیلافەتی ڕاشیدە بۆ مەلیكایەتیەكی میراتی وپشتاوپشتی، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ ئەم سیستەمە بە یەجگاری ڕووی لە ڕاوێژی خەلیفە ڕاشیدەكان وەرسوڕاندبێت، یان لە فەرمانەكانی ئیسلامو پرۆگرامی حوكمڕانیەكەی هەڵگەڕابێتەوە، نەخێر، بەڵكو ئەم پەرەسەندنە سیاسیو كۆمەڵایەتیە پاساوی خۆیان هەنو لەسەریان دەهێنرێنەوە، وەكو (إبن خلدون) دەڵێت: واتاكانی سیستەمی خیلافەت لە دینداریو پەیڕەولێكردنی لە سەردەمی (معاویە)و چاخی ئومەویدا وەكو خۆیان مابوونەوە، ئەوەی گۆڕانی بەسەردا هاتبوو، تەنها پاڵنەرەكە بوو، كە لە دینەوە بەرەو شمشێرو دەمارگیری گۆڕا، كاروبارەكانی حوكومەتداری هەموو سەردەمەكانی (معاویەو مەروانو عبدالملك ی كوڕی)و بەشی یەكەمی عەباسیەكان هەتا سەردەمی ڕەشیدو هەندێك لە ڕۆڵەكانی واتاكانی خیلافەتو بۆنو بەرامەی دینداریيان پێوە مابوو، ئەمجا دوای ئەوان خیلافەت تەنها ناوەكەی مایەوە.[١]

لێرەدا نابێت ڕایەكەی (إبن خلدون) بە ڕەهایی وەرگیرێت، چونكە لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیداو لە زەمانی (محمد فاتح)دا هەندێك لە واتاكانی (خیلافەت)ی وەكو: (بزوتنەوەی فتوحات، بانگەوازی ئیسلام، بەهێزكردنی دەسەڵاتی ئیسلام، دادپەروەری) بوژێنرانەوە، (شەریعەتی ئیسلام)یش زەمبی دەمارگیریو مەلیكایەتی نەكردووە كە ئامانجی بەرپاكردنی (دین)و سەرخستنی (هەق)ی لە نەزەر گرتبێت، (سولەیمان) (سەلامی خوای لێ بێت) لەبەر پەروەردگار پاڕایەوەو وتی: ﴿رَبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَهَبۡ لِي مُلۡكٗا لَّا يَنۢبَغِي لِأَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِيٓۖ﴾[٢] واتە: ئەی پەروەردگار لێم خۆشبە، مەلیكایەتیەكی وام پێ بدەی كە لە دوای من بە كەسی تری نەدەی.

كاتێك ئەم داوایەی خستەڕوو كە زانی دڵو دەروونی تەنها بە پێغەمبەرایەتیو مەلیكایەتیەوە پەیوەست دەبێتو نیازی كاری ناهەقی نابێت لەمەدا.[٣]

سەرەڕای ئەمە هەر مەلیكایەتیەك لەگەڵ خیلافەت پێچەوانەو دژ بێت ئەوە ستەمگەریو خۆسەپێنیە،[٤] كە دەیەوێت بە ناهەق بەسەر خەڵكدا زاڵ بێت، (معاویە) لە میانەی خیلافەتەكەیدا ئەم مەبەستانەی نەبوونو كاریشی بۆ نەكردوون، لێك نزیكبوونی ئامانجو

١ مقدمة إبن خلدون، نقلا عن الدولة الأموية المفترى عليها (ص: ٢٧٥).

٢ ص (٣٥).

٣ مقدمة إبن خلدون، نقلا عن الدولة الأموية المفترى عليها (ص: ٢٧٥).

٤ المصدر نفسه.

مەبەستەكانی خيلافەتی (معاويە) لە ئامانجو مەبەستەكانی خيلافەتی (ڕاشيدين) سەرنجی هەندێك لە شەرعزانو مێژوونووسانی بە لای خۆيدا ڕاكێشاوە، لەبەر ئەمەيە (إبن تيميە) دەڵێت:.... ئەمە ئەوە دەگەيەنێت كە تێكەڵكردنی خيلافەتو مەليكايەتی لە شەريعەتی ئێمەدا ڕێگەی پێدراوەو، چ دژايەتی دادپەروەريش نيە، هەرچەندە خيلافەتی خۆلاصە باشترە.[1] هيچ لە ڕاستی دوور ناكەوينەوە ئەگەر بڵێين: (معاويە)و هەندێك لە خەليفەكانی (ئومەوی) حەزيان لێبووە بە تەواوەتی بە پەيڕەوی خەليفەكانی ڕاشيديندا بڕۆن، بەڵام لە ميانەی تێكەڵبوونو كارلێككردنيان لەگەڵ بارودۆخی ڕەعيەتەكانيانو كەشو هەوای سەردەمەكانياندا گرفتيان دەهاتە پێشو نەياندەتوانی ئەمە بكەن.

ئەو نموونە بەرزو پرشنگدارە بێ وێنەيەی خەليفە سەرڕاستەكان پێشكەشی سياسەتی ئيسلامیو مرۆڤايەتی يان كرد سەرنجی هەندێك خەليفەو ڕەعيەتەكانی وەكو يەك بە لای خۆيدا ڕادەكێشاو كاری لێ دەكردن، بەڵام گەيشتن بەم ئاستو بەرزەی ئەو نموونە پرشنگدارەی پێيە لە سەرو و تواناى ئەوانەوە بوو، هەوڵيان دەدا بەرەوژوور بچنو بيگەنێ، بەڵام هێزی كێشندەی واقيع دايدەبەزاندنەوەو خۆشيان دانيان بە گرانايی گەيشتن بەمەدا دێناو دەيانوت ئەزموونەكە قورسە.[2]

ڕۆژێك (معاويە) پرسيار لە (يەزيد)ی كوڕیو وەلی عەهدی خۆی دەكات: كە دوای بوونی بە خەليفە چ دەكات؟ ئەويش وتی: وەكو (عومەری كوڕی خەتتاب) حوكمڕانيان دەكەم، (معاويە) زەردەخەنەيەكی هاتو وتی: بە خودا ويستم لاسای (عوسمان) بكەمەوە، بەڵام هەرچەند هەوڵم دا نەمتوانی، جا تۆ چۆن دەتوانی وەكو (عومەر) بەڕێوەی بەری؟![3] واتای ئەوە نيە كە گەڕانەوە بۆ كەشوهەوای سافو بێگەردی سەردەمی خەليفە ڕاشيدەكان مەحاڵ بێت، ئەم گەڕانەوە بە تەنيا بە نيازی هەوڵی حوكمڕان ئەنجام نادرێت، بەڵكو ئامانجێكی لەم جۆرە دەگونجێت بە يەكخستنو ڕێكەوتنی ئيمامو ئوممەتو سەركردايەتیو ژێركردايەتیو هاريكاری هەمەلايەنە بهێنرێتە دی، بەڵام ئەمە ڕێگايەكی درێژو سەختەو حەوجەی بە بانگخوازانو فەرمانڕەوايانێكی وا هەيە ئەوپەڕی هەوڵو تەقالای خۆيان بۆ پەروەردەكردنی جەماوەر لەسەر ئيمانێكی تۆكمەو تەواو بە گەڕ بخەنو پێشەنگايەتيەكی نموونەيی جوانو

١ الفتاوى (٣٥/١٨).

٢ الدولة الأموية المفترى عليها (ص: ٢٧٦).

٣ البداية والنهاية، نقلا عن الدولة الأموية المفترى عليها (ص: ٢٧٦).

ڕێکوپێك پێشکەش بکەنو کاتو هەوڵو ماندووبوونی خۆیان لەم پێناوەدا خەرج بکەن،[1] (إبن تیمیة) ئەم ڕاستیە دەردەبڕێتو پێی وایە پەیدابوونی گەندەڵی لەنێو حوکومەتدا هۆکاری حوکمڕانانو ئوممەتە بە یەکەوە.[2]

(ڕاوێژ) لە سەردەمی (معاویە)و (دەوڵەتی ئومەوی)دا بە قەد (ڕاوێژ)ی سەردەمی خیلافەتی ڕاشیدە بەرفراوان نەبوو، هەرچەندە لە سەردەمی (معاویە)دا هەندێك ڕووی وەکو خۆی مابوونەوە بەڵام بەم شێوەیەش کە هەندێك کەس دەیخەنە بەرچاو بەرەوپێش نەچووبوو.

## شەشەم: ئازادی ڕادەربڕین لە سەردەمی (معاویە)دا (خودا لێی ڕازی بێت):

بەرهەڵستکاری ئاشتیانە: (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) جیاوازی دەخستە نێوان بەرهەڵستکاری ئاشتیانەو بەرهەڵستکاری چەکدارانە، ئەو لە چوارچێوەی ئازادی ڕادەربڕیندا ڕێی بە دەربڕینی بیروڕاو قسەکردنی خەڵك دابوو، بەڵام ئەگەر شتەکە سەری کێشابا بۆ هەڵگرتنی چەكو تیژکردنی شمشێر، ئەوا ئەو جگە لە کپکردنەوەی ئەم شۆڕشانە (وەکو لە بەرانبەر (خەواریج)دا ئەنجامی داو بە ئیزنی خودا لەمەولا باسی لێوە دەکەین) هیچ ڕێگەیەکی تر شك نابات بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیان، لێیەوە گێڕدراوەتەوە کە وتوویەتی: هەتا خەڵك ڕێی نێوان ئێمەو پۆستی دەسەڵاتمان نەگرن ئێمەش ڕێی نێوان خۆیانو زمانیان ناگرین.[3]

(زیادی بن ابیە)ی کاربەڕێوەبەری (عێراق)ی لە وتارێکدا بۆ خەڵکی (بەصرە) وتی: ئەگەر بزانم یەکێك لە ئێوە لە داخی من سیلی هەڵێناوە، دەمامکی لێ هەڵنامالّمو پەردەی سەر ڕازی نادڕێنم، هەتا بۆ خۆی دەری نەخات، ئەگەر وای کرد مۆڵەتی نادەم.[4] دەربارەی

---

١ الدولة الأموية المفترى عليها (ص: ٢٧٧).

٢ مجموع الفتاوى (٣٥/٢٠)، الدولة الأموية المفترى عليها (ص: ٢٧٧).

٣ دکتۆر (خالد الغيث) لە کتێبەکەیدا (مرويات خلافة (معاوية) في تاريخ الطبري ص (٢٨١ـ٢٨٢)دا دەڵێت: دوو (دەردو عیللەت) لەم ڕیوایەتەدا جەم بوون، یەکەم: (عبدالله کوڕی صالح الجهنی) بە (عبدالملك کوڕی عمير) نەگەیشتووە، چونکە (عبدالله کوڕی صالح) بە ساڵێك دوای مردنی (عبدالملك کوڕی عمير) لە دایك بووە، دووەم: شیعەگەرێتی (هیشامی کوڕی سعد)، ڕق لێبوونەوەی شیعە لە بەرانبەر (بەنی ئوممەیە)دا زانراوە، لەبەر ئەمە لە شوێنێکی لەم شێوەدا قسەی لێ وەرناگیرێت، چونکە شتێك دەبێژێت کە لەگەڵ ئارەزووی بێتەوە.

٤ تاريخ الطبري، نقلا عن الدولة الأموية المفترى عليها (ص: ٣٠٢).

بەرهەڵستکارێکی دەڵێت: ئەگەر بزانم مۆخاوی قاچی لە داخی من هەڵدەڕژێت، هەتا لە دژم دەرنەچێت بە گژی دا ناچم.[١]

هەڵوێستگەلێکی زۆر هەن دەبنە بەڵگە لەسەر ئازادی ڕادەربڕینو هەبوونی مافی بەرهەڵستکاری ئاشتیانەو فەرمان بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپە لە سەردەمی معاویەدا، هەندێك لەو هەڵوێستانە:

١ـ أبو مسلم الخولاني: (ئەبو موسلیم) (بەر ڕەحمەتی خودا بکەوێت) یەکێك بوو لە ڕیزی ئەو زانا شکۆمەندانەی لەسەر چاپلوسیو خۆڕەپێشکردن ڕانەهاتبوون، جارێك لە بەرانبەر (معاویە)دا ڕاست بۆوەو بەم شێوەیە ئاگاداری کرد: ئامان سەد ئامان ڕووی خۆت بدەیتە هۆزێك لە هۆزە عەرەبەکانو بەمە جەورو ستەمت دادپەروەریەکەت ڕامالێ،[٢] دەچووە لای (معاویە)و بە بیری دەخستەوە کە چ بەرپرسیاریەتێکی لە بەرانبەر ڕەعیەتەکەی لە ئەستۆدایەو هانی دەدا مافەکانی خۆیان پێ بدات، ڕۆژێك دەچێتە لایو دەڵێت: سڵاوت لێ بێ ئەی (ئەجیر)= بەکرێگیراو، خەڵکی وتیان: (ئەمیر)!، (معاویە) وتی: واز لە (ئەبو موسلیم) بێنن، بۆ خۆی چاکتر دەزانێ چ دەڵێت، (ئەبو موسلیم) وتی: وێنەی تۆ بەم شێوەیە: یەکێك یەکێك بە کرێ دەگرێتو دەیکاتە شوانو سەرپەرشتیاری ئاژەڵەکانی، لە بەرانبەر ئەوەدا شوانیەکی باشو ڕێکوپێکی بۆ بکاتو خوریو شیری زۆر بۆ بەرهەم بهێنێتو کارو بەرخەکانی بۆ گەورە بکاتو، ئاژەڵە لەڕەکانی بۆ قەڵەو بکات، ئەوا لەگەڵ کرێو مزەی خۆیدا پاداشتیشی دەداتێ، بەڵام ئەگەر شوانیەکی خراپو لارو وێر بکات، پاتاڵە قەڵەوەکانی لەڕو لاواز بکات، لاوازەکانی مردار بکاتەوەو، ئاستی بەرهەمی شیرو خوریەکەی دابەزێنێت، ئەوا خاوەنکاری بە کرێگر لێی تووڕە دەبێت!، (معاویە) وتی: ماشاء الله.[٣]

بڕوانە چۆن (ئەبو موسلیم) لە ڕێی هێنانەوەی ئەم وێنەوەو وێچواندنی حاڵی سەرۆك بە شوان: (معاویە)ی هاندا گرنگی بە کاروباری ئوممەت بداتو دۆخی گوزەرانیان باش بکات، تەماشا چۆن لە بەرانبەر کەمتەرخەمیکردنو بە زایەداندا هۆشداری دایە.[٤]

---

١ المصدر نفسه (ص: ٣٠٣).

٢ سير أعلام النبلاء (١٣/٤)، أثر العلماء السياسية في الدولة الاموية (ص: ٢٤٧).

٣ فضيلة العادلين للأصفهاني (ص: ٣٠٦).

٤ أثر العلماء السياسية في الدولة الاموية (ص: ٣٠٦).

لێرەدا هەڵوێستێکی کرداری (ئەبو موسلیم) لەگەڵ (معاویە) دەخەینەڕوو، (معاویە) موچەی خەڵکی ڕاگرتبوو، چووە سەر مینبەر، (أبو مسلم) هەستاو پێی وت: ئەی (معاویە) بۆچی موچەت ڕاگرتووە؟ خۆ نە بە ڕەنجی شانی تۆ نە بە هی باوکت نە بە هی دایکت پەیدا نەبووە تا ڕایگری، (معاویە) زۆر تووڕە بوو ( بێ ئەوەی بەسەر خۆی بێنێت) لە مینبەر دابەزی‌و بە خەڵکی وت: لە جێی خۆتان نەبزون، ماوەیەکی پێ چووو هاتەوەو چووەوە سەر مینبەرو وتی: (ئەبو موسلیم) قسەیەکی وای ئاراستە کردم تووڕەی کردم، من گوێم لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بوو دەیفەرموو: ((الغضب من الشيطان، والشيطان خلق من نار، وإنما تطفأ النار بالماء، فإذا غضِبَ أحدكم فليغتسل))[1] واتە: تووڕەیی لە شەیتانەوەیە، شەیتان لە ئاگر دروست کراوە، ئاگر بە ئاو دەکوژێتەوە، جا ئەگەر یەکێکتان تووڕە بوو با بچێت خۆی بشوات. ئێستا من چووم خۆم شوشت، (ئەبو موسلیم) ڕاستی وت: (ئەم سەروەت‌و سامانە) نە بەری ڕەنجی منە، نە بەری ڕەنجی بابمە، بڕۆن موچەکانتان وەربگرن.[2]

٢ــ (الفرزدق) هەجوی (معاویە) دەکات: فیرەزدەق(ی شاعیر) بە پاڵنەری غەرەزی شەخسی توانج لە معاویەی دەگرێت و بە باسکردنی ڕەچەڵەکی بابو باپیرانی شانازی بەسەردا دەکا، (حەتتاتی کوڕی یەزیدی مەجاشیعی)ی مامی (فیرەزدەق) لەگەڵ وەفدێك سەردانی (معاویە) دەکات، (معاویە) سەرو بەخششێکیان دەداتێ، بەڵام هی (حەتتات) لە هی هەموان کەمتر دەبێت‌و، لە ڕێی گەڕانەوەیدا دەمرێت، (معاویە) بەخششەکە بۆ (بیت المال) دەگێڕێتەوە، (فیرەزدەق)یش ئەم هۆنراوە بوانجئامێزە ئاراستەی (معاویە) دەکات:

فلو كـان هـذا الأمر في جـاهلية ... علمت من المرء قليل جلائبة
ولو كان هذا الأمر في غير ملككم ... لأبديته أو غص بالماء شاربه
وكم من أب لي يا معاوي لم يكن ... أبوك من عبد شمس يقـاربه

ئیتر (معاویە) خێرا خەڵاتەکەی بۆ ماڵ‌و خێزانەکەی(حەتتات) بەڕێکردەوە.[3]

سەرانی موسڵمانان‌و ڕۆڵەی هاوەڵان ئەو جۆرە کەسایەتیانە بوون کە (معاویە) زۆری ڕێز لێ دەگرتن، هەرچەندە لە لایەن هەندێکیانەوە ڕەخنەی توندیشی ئاراستە دەکران، بەڵام ئەو

---

١ سنن أبي داود (٤/٢٤٩).
٢ مقامات العلماء بين يدي الخلفاء والأمراء (ص: ٣٠٧)، أثر العلماء السياسية في الدولة الاموية (ص: ٣٠٧).
٣ الدولة الاموية المفترى عليها (ص: ٣٠٤)، تاريخ الطبري (٦/١٥٩).

قسەیەی زۆر دەوتەوە: من خۆم لەوە بە بەرزتر دەگرم کە گوناهێك لە لێبوردنم بە گەورەتر دابنێم، پێم وابێت نەفامیەك لە ئاقڵم زیاترە، یان نەتوانم نەنگیەك بە پەردەی خۆم بپۆشم، یان خراپەیەك لە چاکەی خۆم زۆرتر بێت،[١] جاروبار ئەم دێرە شێعرانەی بە پەند دەهێنانەوە:

تعفو الملوك عن الجليل من الأمور بفضلها
ولقد تعاقب في اليسير وليس ذاك لجهلها
إلا ليعرف فضلها ويخاف شدة نكلها[٢]

٣ـ (ئوم سەنان کچی خەیثەمە) لە مەجلیسی (معاویە)دا:

(ئوم سەنان کچی خەیثەمەی موذحەجی) یەکێك بوو لە پشتیوانانی (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران (خودا لێی ڕازی بێت)، لە سەردەمی معاویەدا چوو بۆ (دیمەشق) و ئیزنی لە (معاویە) خواست سەردانی بکات، ڕێی پێدا، کە چووە ژوورەوە ناوی باب‌و باپیری خۆی بۆ هەڵدا، کە ناسی فەرمانی پێکرد دانیشە، کە دانیشت (معاویە) پێی وت: خۆش هاتی کیژی (خەیثەمە)، چ شتێك تۆی هێناوەتە خاکی ئێمە، خۆ تۆ پەیمانت دابوو ڕکابەری تایەفەکەم بکەیت‌و لە دژی من هانی دوژمنەکەم بدەی؟ وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران: ڕۆڵەو وەچەکانی (عبدالمناف) چەند ڕەوشتێکی پاك‌و خاوێن‌و نیشانەیەکی دیارو ئەقڵێکی بەرفراوانیان هەیە، دوای ئەوەی بوون بە زانا نەزان نابن، دوای ئاقڵ بوون نەفام نابن، دوای لێبوردن سزا نادەن، تۆ لە هەموو کەس شایانتری شوێنپێی ڕەوشت‌و داب‌و نەریتی باب‌و باپیرانت کەوی، (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) وتی: ڕاستت وت ئەی (ئوم سەنان)، ئێمە هەر ئاواین.

ماوەیەك بێدەنگی باڵی بەسەر مەجلیسەکەدا کێشا، (معاویە) بەخوێندنەوەی هۆنراوەیەکی (أم سنان) –کە هاندانی دژی (معاویە)ی لەخۆگرتبوو– پەردەی بێدەنگیەکەی هەڵدڕی‌و پێی وت: ئەم هۆنراوەیەت چۆنە؟

عزب الرقاد فمقليتي ما ترقد ... والليل يصدر بالهموم ويورد
يا آل مذحج لا مُقام فشمِّروا ... إن العدوَّ لآل أحمد يقصد
هذا عليٌّ كالهلال تحفُّهُ ... وسط السماء من الكواكب أسعد
ما زال مذ شهد الحروب مظفراً ... والنصر فوق لوائه ما يفقد

---

١ المصدر نفسه (ص: ٣٠٤).
٢ تاريخ الطبري (٢٥٣/٦).

(ئـوم سـەنان) بـەر ڕەحمـەتی خـودا بکـەوێت گـوێی لـە هۆنراوەکـەی ڕاگرتبـوو، کاتێـك (معاویە) لێبۆوە، پێی وت: ئەمە وابوو ئەی ئەمیری ئیمانداران، ئێمە بە تـەماین تـۆ جێگـەی ئەو (واتە عەلی) بگریتەوە، تۆ شایانی ئەمەیت، بـەر لـەوە (معاویـە) قـسە بکـات، یـەکێك لـە ئەندامانی مەجلیسەکەی وتی: چۆن وایە (و بڕوای پێ دەکەی) ئەی ئەمیری ئیمانـداران، مـن هۆنراوەیەکی ئەوم دەرخ کردووە ڕێك پێچەوانەی ئەو قسانەیەتی کە ئێستا بۆ تۆیان دەکات، ئەو دەڵێت:

إمـا هلكت أبـا الحسين فلم تزل بـالحق تُعرف هـاديـاً مهديـاً

فاذهب عليك الصلاة ربك ما دعت فوق الغصون حمامـة قمريـاً

فـاليوم لا خلف يؤمل بـعـده هيهـات نـمدح بعده إنسيـاً[١]

لەو دەمەدا نیشانەکانی ڕاستگۆیی‌و پتـەوی لەسـەر دەموچـاوی (ئـوم سـەنان) ڕەنگیـان دەهێنان‌و دەبردن‌و ڕووی لە (معاویە) کردو وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران، زمان هاتۆتە گـۆو قسەیەکی ڕاست‌و دروستە، بـا گومانەکـەمان لـە تـۆدا بـە ڕاسـت بگـەڕێت، تـۆ پـشکت لەمـە زیاترە، (ئاماژەی بە هەندێك دانیشتووی مەجلیسەکەی دا)و وتی: سوێند بە خـودا تـەنها بـە هۆی خەڵکانێکی ئاواوە، ڕقت چۆتە نێـو دڵـی موسـڵمانانەوە، قـسەکانیان بـە درۆ دانـێ، لـە خۆتیان دوور بخەرەوە، تۆ ئەگەر ئەمە بکەی زیاتر لە خودای بەرزو مەزن نزیـك دەبیتـەوەو بـە لای موسـڵمانانەوە خۆشەویـستتر دەبـی، (معاویـە) سـەری لـە قـسەکانی سـوڕمابوو و قسەکەی پێ بڕی‌و وتی: ئەوە تۆی ئەمە دەڵێی ئەی (ئوم سەنان)؟ وتـی: سـبحان الله، ئـەی ئەمیری ئیمانداران، بە خودا کەسێکی وەکو تۆ بە بەلاش ستایش ناکرێت، بـە درۆو دەلەسـە پاساوی بۆ لا ناهێنرێتەوە، تۆ ئەمە لە دڵ‌و ویژدان‌و بیروڕای ئێمەوە دەزانی، سـوێند بـێ بـە خودا: هەتا (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) زیندوو بوو لە تۆمان زیاتر خـۆش دەویـست، هـەتا تۆش بمێنی لە خەڵکانی ترمان خۆشتر دەوێی، (معاویە) لێـی پرسـی هـەتا بمێـنم لـە کێتـان خۆشتر دەوێم؟ وتی: ئەی ئـەمیری ئیمانـداران! تـۆ لـە (مـەروانی کـوڕی حەکـەم‌و سـەعیدی کوڕی عاص) بە لامانەوە خۆشەویـستتری، وتـی: بـە چ هـەقێك بەسـەر ئەوانتـدا هەڵبـژاردم؟ وتی: بە ئاوەزو سینگی فراوانت‌و لێبوردن‌و چاوپۆشی بەخشندانەت.[٢] دوای چەند قـسەیەکی تر گفتوگۆکە کۆتایی هات‌و (معاویە) لێی پرسی: ئوم سەنان! ئێستا پێویستیت چیە؟ وتـی:

---

١ العقد الفريد (١٠٨/٢)، نساء من عصر التابعين، أحمد جمعة (ص: ٢٧٨).

٢ نساء من عصر التابعين (ص: ٢٨٠)، شاعرات العرب (ص: ١٧٦ـ١٧٧).

کە نەوەیەکی لە (مەدینە) بەندکراوەو هاتووە بڕیار بدات ئازاد بکرێت، (معاویـە)ش وەڵامـی داواکەی دایەوەو ڕێزی زۆری لێناو بارگەی بۆ پێچایەوەو هەرچی پێویـستی بـوو بـۆی دابـین کردو بـەرەو (مەدینـە)ی بـەڕێکردەوە، ئـیتر لەمـەولا بـە خێـر زمـانی لـە بەرانبـەر (معاویـە) دەگەڕاو بەردەوام بۆی دەپاڕایەوە.[1]

ئەم ژنە (أم سنان المذحجیة) یـەکێك بـوو لـە شـۆڕەژنەکانی سـەردەمی (تـابعین)و خـۆی لەسەر ڕاستی‌و ڕاشکاوی ڕاهێنابوو، پشکی باشی لە ڕەوانبێژی‌و پەندو حیکمـەت پێـدرابووو بە هۆیەوە ناوی لە تۆمارێکی پرشنگداری مێژوودا تۆمارکراوەو ،چیرۆکەکەی زیندوویێتی ئەوو هاوشـێوەکانی نیـشان دەدا،[2] (أم سـنان) لـە گۆڕەپـانی دەربڕینـی بـیروڕای سەربەسـتانەو ڕاشـکاوانەدا تاکـە سـوار نـەبوو، بـەڵکو ئافرەتگـەلێکی زۆری ویژدانزینـدوو و قـسەڕەوان‌و هەقبێژو نەترس هەبوون، وەکو: (زەرقای کچی عـەدی)و[3] (أم الخـیری کـچی حـدیش)و[4] هـی تـریش، (معاویـە) (خـودا لێـی ڕازی بێـت) تـەکانی بـە جورئـەتی خـەڵك دەدا بیروڕاکانیـان دەربڕن، هەمیشە خەڵکی بەرەو ئازادی ڕادەربڕین‌و مافی ڕەخنەو بەرهەڵستکاری ئاشـتیانە هەڵدەنا.

---

١ نساء من عصر التابعين (ص: ٢٨٠).

٢ المصدر نفسه (ص: ٢٨٠).

٣ المصدر نفسه (ص: ٢٩٦).

٤ المصدر نفسه (ص: ١٤٨).

# فەسلی سێیەم

## سیاسەتی نێوخۆی حکومەتەکەی ( معاویە ) ( خودا لێی ڕازی بێت )

ساڵی (٤١)ی کۆچیو بە کۆڕای ئۆممەت پۆستی خیلافەت درا بە (معاویە)، هەموو هەوڵو تواناو زیرەکیو لێزانیی خۆی بۆ بەرقەرارکردنی ئاسایشی جیهانی ئیسلام خستەگەڕ، پەیڕەوی لە سیاسەتێکی نێوخۆ کرد کە لەسەر چەند پایە دامەزرابوو:

## باسی یەکەم

## ئەنجامدانی چاکە لە بەرانبەر گەورە کەسایەتیەکاندا ( هاوەڵە بە تەمەنەکانو کوڕەکانیان، بە تایبەتی هاشمزادەکان )

لە وتارێکیدا کە ئاراستەی دانیشتوانی (حیجاز)ی کرد سەبارەت بەوە کە نەیتوانیوە ڕێبازی خەلیفە سەرڕاستەکان بگرێتەبەر عوزری خۆی عەرز کردنو وتی: وێنەی ئەوانە لە کوێ دەست دەکەون؟ کێ دەتوانێ وێنەی کردارو هەڵوێستی ئەوان ئەنجام بدات؟ هەیهو، هەیهو، کەسێك لە دوای ئەوان بێتو بتوانێت بگاتە پلەو پایەی ئەوان بەر ڕەزاو ڕەحمەتی خودا بکەون، بەڵام من (لەم پۆستەدا) ڕێگایەکم گرتۆتەبەر، کە هەم سوودی بۆ من تێدا بێت، هەم سوودی بۆ ئێوە تێدابێت، ئەگەر ڕێوڕەوشت چاك بێتو گوێڕایەڵیو فەرمانبەرداری هەبێت ئەوا خواردنو خواردنەوەیەکی باشی بۆ هەموو لایەك تێدا دەبێت، ئەگەر باشترین کەسایەتی نێو ئێوەش نەبم، ئەوا هەوڵ دەدەم بۆتان باش بم، بە خودا کەسێك شمشێری لا نەبێت شمشێری لە دژ ڕاست ناکەمەوە، وەکو زانیوتانە هەرچەندە شولی لێ هەڵکێشێتو بەربەرەکانێش بکات دەیخەمە پشت گوێمەوە، ئەگەر دیتتان هەموو مافێکتان پێ نادەمو بۆتان جێبەجێ ناکەم، ئەوا بەوەندە ڕازی بن کە دابینی دەکەم.... خۆتان لە ئاشوب دوور بخەنەوەو بیری لێ مەکەنەوە، ئاشوب ژیانو گوزەران تێك دەداتو نازو نیعمەت دەشێوێنێتو بنبڕکردنی موسڵمانان لە دوای خۆیەوە بەجێ دێڵێت، أستغفر الله لي ولكم.[١]

بە گرتنەبەری ئەم ڕێوڕەوشتە بوو بە خەلیفەی موسڵمانانو تێکڕای ڕۆڵەی کۆچەرانو پشتیوانانو هەموو ئەو کەسانەش کە پێیان وابوو بۆ پۆستی خیلافەت لە ئەو شایانترن فەرمانبەرداری بوون، ئەو (خودا لێی ڕازی بێت) بەوپەڕی بە ئاگاییو وریاییەوە مامەڵەی

---

١ البداية والنهاية (١١/٤٣٢).

ـەگەڵ ئۆممـەت دەکـردو بـە چـاکەو ڕووی خـۆش‌و دەسـتی پـڕەوە ڕووبـەڕوویان دەبـۆوەو سەرنجی ڕادەکێشان‌و دڵو دەروونی داگیر دەکـردن، وای دادەنـا کـە گـەورە کەسـایەتیەکان هەریەکەیان بەرپرس‌و پێشەنگی کۆمەڵـە خـەڵکێکن‌و بـارێکی قورسـیان لەسـەر شـانە، بۆیـە گرنگـی زۆری پـێ دەدان‌و بـە خـاتری پڕکردنـەوەی کەلێنـەکان‌و بـە دەمەوەچـوونی پێویـستیەکان‌و چارەسـەرکردنی گرفتـەکان سـەروەت‌و سـامانی بـێ شـوماری دەخـستنە بەردەست‌و لەم نێوەدا کەسایەتیەکانی (بەنی هاشم) لەگەڵ ئەوەشدا بەشداری حکومـەتیان نەدەکردو حەزیان لێ نەبوو، بەڵام بە حوکمی ئەوەی لە هەموو خەڵکانی تری ئـەو سـەردەمە زیاتر خاوەن بنکەی جەماوەری بوون‌و ئەوەندەی خەڵك ڕوویان لـە ئـەوان دەکـرد هێنـدەیان ڕوو لـە والی‌و کاربەڕێوەبـەرەکانی حکومـەت نـەدەکرد لەبـەر ئەمـە (معاویـە) پـشك‌و بەشـی زیاتری بۆ ئەمان دادەنا.[1]

## یەکەم: پەیوەندی نێوان (حەسەن)و (معاویە) (خودا لێیان ڕازی بێت) لە دوای صوڵح:

کە (معاویە) بوو بە خەلیفە (حەسەنی کوڕی عەلی) سەردانی دەکرد، جارێك دەچێتە لای‌و (معاویە) پێی دەڵێت: بە خـودا دەبێـت خـەڵاتێکی وات پـێ بـدەم لـە پـێش تـۆدا بـە کەسـم نەدابێت‌و لە دوای تـۆش بـە کەسـی نـادەم، ئەمـەو چوارسـەد هـەزاری پێـداو ئـەویش وەری گـرت[2].... لـە ڕیوایـەتێکی تـردا هـاتووە: (حەسـەنی کـوڕی عـەلی) سـاڵانە جارێـك سـەردانی (معاویــە)ی دەکــرد، (معاویــە)ش ســەد هــەزاری بەخــشش پــێ دەدا، ســاڵێکیان ناچــێت (معاویـە)ش هیـچی بـۆ نانێرێت،ئیـدی حـسن داوای قەڵـەم‌و کاغـەز دەکـات‌و پـێش ئـەوەی نامەکەی بۆ بنووسێت خەوی لێ دەکەوێت، پێغەمبەر (ﷺ) دێتە خەونی‌و پێی دەفەرموێت: ئەی (حەسەن) نامە بۆ دروستکراوێك دەنوسیت‌و پێداویستی خۆتی بۆ دەخەیتـەڕووو واز لـە پاڕانەوە دێنیت‌و داوا لە پەروەردگارت ناکەی؟ وتی ئـەی پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) چ بکـەم، زۆر قەرزارم، فەرمووی: ((قل: اللهم إني أسألك من كل أمـر ضـعفت عنـه قـوتي وحيلـيتي ولم تنته إليه رغبتي ولم يخطر ببالي ولم يبلغه أملي، ولم يجد على لساني من اليقين الذي أعطيته أحداً من المخلوقين الأولين والمهاجرين والآخرين إلاّ أخصـصتني يـا أرحـك الـراحمين)) واتـە: خودایە لە بەرانبەر هەر کارێکدا هێزم پێ ناشکێت‌و سەرم لێی دەرناچێت‌و ئارەزووو ئومێدم

---

١ (معاوية) بن أبي سفيان للغضبان ((ص: ٣١٤).
٢ سير أعلام النبلاء (٣/٢٦٩).

نایگاتی و زەینم زەفەری پێ نابات و بەسەر زمانمدا نەهاتووە، لەو جۆرە یەقین و دڵنیاییەم پێ ببەخشی کە بەخشیوتە بە هەر یەکێك لە پێشینان و کۆچەران و پاشینان، ئەی خودای بەخشندەی بەبەزەیی داوات لێ دەکەم و لە بەرت دەپاڕێمەوە تایبەتم بکە بەو جۆرە یەقینەوە.

(حەسەن) وتی: لە خەوەکەم ڕابووم و دوعایەکەم دەرخ کردبوو، بەردەوام پێی دەپاڕامەوە، هێندەی نەخایاند (معاویە) باسی کردبووم، پێی وترابوو: ئەمساڵ نەهاتووە، ئەویش فەرمانی دوو سەد هەزار درهەمی بۆ دابوو.[1]

بە گوێرەی ڕیوایەتێکی تر: (حەسەن) لە خەونیدا ئەم نزایەی لە لایەن پێغەمبەر (ﷺ)ەوە فێرکرا: ((اللهم اقذف في قلبي رجاءَك، واقطع رجائي عمن سواك لا أرجوا أحداً غيرك، اللهم وما ضعفت عنه قوتي، وقصر عنه عملي، ولم تنته إليه رغبتي، ولم تبلغه مسألتي ولم يجد على لساني مما أعطيت أحداً من الأولين والآخرين من اليقين، فخصني به يارب العالمين)) واتە: خودایە بیخەرە دڵمەوە تەنها ئومێدم بە تۆ بێت و جگە لە تۆ ئومێدم بە کەسی تر نەبێت، ئومێدم بە هەر کەسێك بێ جگە لە خۆت لە دڵو دەروونمی دەربێنە، ئەی پەروەردگارم! هەر چ شتێکی باشت کردۆتە خەڵاتی کەسانێك لە پێشینان و پاشینان لە یەقین لە بەرانبەر هەر کەسێکدا هێزم پێی ناشکێت و کردارم دەرۆستی نایەت و نە ئارەزووم نە داواکاریم نایگاتیو بەسەر زماندا نایەت؟ داوات لێ دەکەم پێم بدەی، ئەی پەروەردگاری جیهانیان تایبەتم بکە بە ئا ئەو جۆرە یەقینەوە، وتی: بە خودا ماوەی هەفتەیەك لەسەر ئەم پاڕانەوە بەردەوام نەبووم، هەتا ئەوەی (معاویە) هەزار هەزارو پێنج هەزار، واتە (ملوێنێك و پێنج سەد هەزار)ی بۆ ناردم، جا وتم: سوپاس بۆ ئەو خودایە کەسێك فەرامۆش ناکات یادی بکات و کەسێك دەست بەتاڵ ناکات لێی بپاڕێتەوە، دیسان پێغەمبەر (ﷺ)م لە خەومدا بینیو فەرمووی: ((یا حسن کیف أنت؟)) واتە: ئەی حەسەن تۆ چۆنی؟ وتم: ئەی ڕەسوڵی خودا باشم، ئەمجا ڕووداوەکەم بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: ((یا بنيَّ هكذا من رجاالخالق ولم يرج المخلوق))[2] واتە: ڕۆڵە گیان هەر کەسێك ئومێدی بە خودای دروستکەر بێت و ئومێدی بە دروستکراو نەبێت دەبێت بەم شێوەیە بێت و ئەنجامەکەشی بەم شێوەیە دەبێت.

---

١ تاريخ دمشق (١٤/١٨).

٢ المصدر نفسه (١٤/١٨).

(الزهری) دەگێڕێتەوە:.... کاتێك (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) (خودا لێی ڕازی بێت) کوژرا، (حەسەنی کوڕی عەلی) هاتە لای (معاویە)، (معاویە) پێی وت: پلەوپایەت لە یەزید بەرزتر نەدەبوو، ئەگەر دایکی تۆ (قورەیشی) نەدەبوو دایکی ئەویش (کەلەبی) نەدەبوو، ئەوا ئەو لە تۆ پایەبەرزتر دەبوو، بەڵام چۆن شتی وا دەبێ لە حاڵێکدا دایکی تۆ (فاطمة)ی کچی پێغەمبەری خودا (ﷺ)ە.[1]

## دووەم: چاکەی (معاویە) لە بەرانبەر (حەسەن)و (عبدالله ی کوڕی زوبێر)دا (خودا لێیان ڕازی بێت):

(جەعفەری کوڕی محمد) لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە: کە (حەسەن‌و حوسەین) (خودا لێیان ڕازی بێت) خەڵات‌و بەخششیان لە (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) قبوڵ دەکرد.[2]

جارێك (معاویە) فەرمان دەدات (سەد هەزار) بۆ (حەسەن) بنێردرێت، کاتێك بە دەستی گەیشت بە خەڵکی دەوروبەری وت: هەر کەسێك چەند هەڵدەگرێت با هەڵبگرێت، (سەد هەزار)ی تریش بۆ (حوسەین) دەنێرێت، کاتێك بە دەستی دەگات، دە کەسی لە لا دەبن، کردی بە دە بەشەوەو هەریەکەی (دە هەزار)ی پێدان، هەر هەمان جار فەرمانیدا (سەد هەزار) بۆ عبدالله(ی کوڕی زوبێر)یش بنێردرێت.[3]

کاتێك (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) بگەیشتبایە بە (حەسەنی کوڕی عەلی) (خودا لێیان ڕازی بێت) دەیوت: خۆش هاتی بۆ ماڵی خۆت ئەی کوڕی پێغەمبەری خودا (ﷺ)، ئەمجا فەرمانی دەدا سێ سەد هەزاری بدرێتێ، دەگەیشت بە (عبدالله ی کوڕی زوبێر) (خودا لێیان ڕازی بێت)و دەیوت: بە خێرو خۆشی هاتی ئەی کوڕی پورزای پێغەمبەری خوداو (ﷺ) ئەی کوڕی (حواری)پیاوە دڵسۆزەکەی پێغەمبەری خودا (ﷺ)، ئەمجا فەرمانی دەدا سەد هەزاری پێ بدرێت.[4]

دوای ئەوە (معاویە) کۆچی دوایی کرد، (عبدالله ی کوڕی زوبێر) بە باشە باسی لێوە دەکرد، (هوشامی کوڕی عوروەی کوڕی زوبێر) دێتە قسەو دەڵێت: ڕۆژێك (عبدالله) نوێژی کرد، دوای سەلامدانەوە ماوەیەك بە ماتی سەری لەبەر خۆنا، خەڵك وتیان: ئەوە لەبەر

---

١ الشريعة للأجري (٥/٢٤٧٠) إسناده حسن.
٢ الشريعة (ص: ٢٤٧٠)، إسناده حسن.
٣ تاريخ دمشق (٦٢/١٣٣).
٤ المصدر نفسه (٦٢/١٣٣).

خۆیەوە قسە دەکات، ئەمجا ئاوڕی دایەوە بۆ لامان‌و وتی: دەك خوا کوڕەکەی(هیند) لە ڕەحمەتی خۆی دەرنەکا، ئەو وریایی‌و فێڵزانیەی لەودا بەرجەستە ببوو، تاهەتایە لە کەسێکی تردا نایبینینەوە، بە خودا ئەگەر بمانویستایە بیترسێنین، هیچ شێرێکی چەنگبەخوێن لە جەنگدا هێندەی ئەو ئازا نەبوو تا لێمان ترسابایە، ئەگەر بمانویستایە هەڵی بخەڵەتێنین، ئەوا کەسێك لەم سەر زەویەدا وەکو ئەو بە ئاگاو فێڵزان نەبوو تا پێمان هەڵخەڵەتابایە، وەڵڵاهی حەزم دەکرد تا ئەم کێو(ی ئەبوقوبەیس)ە بەردێکی پێوە دەما ئەویش بمابایەو سودمان لێی وەرگرتبایە.[1]

(عبدالله ی کوڕی زوبێر) لە کاتێکدا ئەم قسانەی دەکردن کە لە سەردەمی (عبدالملك ی کوڕی مەروان)داو لە مەککە گەمارۆ درابوو.[2]

## سێیەم: ( عبدالله ی کوڕی عەبباس ) ( خودا لێی ڕازی بێت )و ( معاویه ) ( خودا لێی ڕازی بێت ):

عبدالله ی کوڕی عباس سەردانی (معاویه)ی دەکردو ئەویش بە چاوی ڕێزو قەدرزانییەوە تەماشای دەکردو لە خۆی نزیك دەکردەوەو بە گەورەی دادەنا، پرسیارو گرێکوێرەکانی خۆی بۆ دەخستنەڕووو ئەویش بێ ڕاوەستان وەڵامی پرسیارەکانی دەدایەوەو، (معاویه) دەیوت: کەسم نەدیوە وەکو ئەو وەڵام بە دەستو خێرا بێت، کاتێك هەواڵنامەی مەرگی (حەسەنی کوڕی عەلی) گەیشت، (عبدالله ی کوڕی عەبباس) لە لای (معاویه) دەبێت، بە ناسکترین دەربڕین سەرەخۆشی خۆی ئاراستەی (عبدالله) کرد، ئەویش بە دەربڕینێکی ناسك، وەڵامی (معاویه)ی دایەوە،[3] هەروەها یەزیدی کوڕی بۆ لا ناردو لە بەردەمی دانیشت‌و بە چەند واژەیەکی کورت‌و ڕەوان سەرەخۆشی ئاراستە کردو (عبدالله ی کوڕی عەبباس)یش سوپاسی کرد.[4]

بە پێی ڕیوایەتی (قەتادە)، (معاویه) بەم شێوەیە سەرەخۆشی (حەسەن)ی لە (عبدالله‌ی کوڕی عەباس) کرد: دەك خودا بە هۆی مەرگی (حەسەن) تووشی خراپەو دڵتەنگی‌و

---

١ عیون الأخبار (١/١١، ١٢).

٢ العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ١١٥).

٣ البداية والنهاية (١١/٦٤٢).

٤ البداية والنهاية (١١/٦٤٢).

خەمباریت نەکات، (عبدالله)ش بەم جۆرە وەڵامی دایەوە: هەتا خودا ئەمیری ئیماندارانمان بۆ بێڵێت توشی دڵتەنگی‌و ناخۆشیمان ناکات. (ڕاوی) وتی: جا (معاویە) یەك ملیۆن درهەم‌و هەندێك کەلوپەل‌و کاڵای پێداو وتی: بیگرەو بەسەر کەسوکاری خۆتدا دابەشی بکە.[١]

(عبدالله ی کوڕی عەباس) یەکێك بوو لە سەروەرو پێشەنگانی هەرە گەورەی کۆمەڵگای ئیسلامی، (معاویە)ش (خودا لێی ڕازی بێت) دەرکی پێگەو پلەو پایە کۆمەڵایەتی‌و زانستیەکەی دەکرد، لەبەر ئەمە (عبدالله) وەکو ڕاوێژکارێکی کاروباری زانستی (خەلیفە) بوو، لە لایەکی دیکەوە (معاویە) دانی بەوە دادێنا کە (هاشمیی)یەکان لە لایەنی سەروەری‌و شکۆوە لە (ئومەوی)یەکان پایەدارترن، جارێك پێی دەوترا: کام لاتان پایەدارترن، ئێوە یان هاشمیەکان؟ وتی: ئێمە (لە ڕووی ژمارەوە) خەڵکانی پایەدارو سەروەرمان زۆرتر بوو، بەڵام ئەوان (لە ڕووی چەندێتیەوە) یەك یەکیان لە ئێمە پایەدارترو سەروەرتر بوون، لە بەرەی (عەبدمناف)دا وێنەی (هاشم) دەست نەکەوتووە، کاتێك کۆچی دوایی کرد، ئێمە خەڵکمان زۆرتر بووو خەڵکانی پایەدارمان زیاتر بوو، بەڵام ئەوان (عبدالمطلب)یان تێدا هەڵکەوت، کە لە نێو ئێمە کەسێکی ئاوا شکۆمەند نەبوو، هەرچی بەرەبابی ئێمە بوو خەڵکانی زۆرمان هەبوون‌و پایەداریش بوون، بەڵام کەسێك لە ئێمەدا لە پایەداریدا خۆی لە شانی کەسێکی ئەوان نەدەدا، ماوەی چاو تروکانێکی نەخایاند شتێکی مەزن دەرکەوت، کە نە پێشینان بینیویانەو بیستوویانە، نە پاشینانیش دەبینن‌و دەیبیستن، بەڵێ (محمد) (ﷺ) لەنێو ئەواندا دەرکەوت.[٢]

(معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت)زەنگی مەترسی بە گوێی ئومەویەکان دادەدا لە بەرانبەر هەر جەنگێك لە دژی بنەماڵەی (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) بیکەن‌و دەیوت: (جەنگ سەرەتاکەی ورتە ورتە، نێوەڕاستەکەی سکاڵایە، کۆتاییەکەی بەڵایە)، داوای لە دڵسۆزەکانی (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) دەکرد، وەصفی عەلی بۆ بکەن‌و گوفتارو ڕەفتارە جوامێرو سەرسوڕهێنەرەکانی بۆ بگێڕنەوە.[٣]

---

١ البداية والنهاية (١١/٤٤٦).

٢ البداية والنهاية (١١/٤٤٦).

٣ الدور السياسي للصفوة (ص: ١٧٢).

## چوارەم: ئایا (معاویە) بڕیاریدابوو لەسەر مینەبەرەكانی دەوڵەتی (ئومەوی) قسە بە (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران بگوترێت؟

كتێبەكانی مێژوو دەڵێن: گوایە والیەكانی پێش (عومەری كوڕی عبدالعزیز) قسەیان بە (عەلی) دەگوت، ئەم گێڕدراوەی (إبن سعد) سەبارەت بەمە هێناویەتی (صەحیح) نیە، (إبن سعد) دەڵێت: (عەلی كوڕی محمد) لە (لوطی كوڕی یەحیا)وە خەبەری داینی‌و وتی: بەر لەوەی (عومەری كوڕی عبدالعزیز) ببێتە خەلیفە، والیەكانی پێش ئەو جنێویان بە (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) دەدان، كاتێك ئەو بوو بە (خەلیفە) ڕێگری لەمە كرد، جا (كثیر عزة الخزاعي) وتی:

| | |
|---|---|
| ولیت فلم تشتم علیاً ولم تخف | بریاً ولم تتبع مقالة مجرم |
| تكلمت بالحق المبین وإنما | تبین آیات الهدی بالتكلم |
| فصدقت معروف الذي قلت | بالذي فعلت فأضحی راضیا كل مسلم[1] |

ئەم ڕیوایەتە لاواز و پەڕپووتە، چونكە(عەلی كوڕی محمدی مەدائینی) لاوازی پێوە دیارە، (لوطی كوڕی یەحیا)ی مامۆستاشی زۆر لاوازە، (یەحیای كوڕی موعین) دەربارەی دەڵێت: جێی بڕواپێكردن نیە، (أبو حاتم) دەڵێت: حەدیسەكانی مەتروكن، (الدار القطني) دەڵێت: هەواڵدەرێكی لاوازە، لە (المیزان)دا دەڵێت: خەبەرەكانی بێ كەڵكن‌و بڕوای پێ ناكرێت،[2] زۆربەی گێڕدراوەكانی لە خەڵكانی لاوازو نەفام‌و بەهیلاكچوو وەرگرتوون،[3] شیعەكان (معاویە) یان بەوە تۆمەتبار كردووە كە گوایە فەرمانی بە خەڵك كردووە لەسەر مینبەرەكانەوە قسە بە (عەلی) بڵێن‌و نەفرەتی لێ بكەن، ئەم پڕوپاگەندەیە بێ بنەمایەو دوورە لە ڕاستیەوە، ئەوەی پشتی ئێمەی شكاندووە ئەوەیە كە: لێكۆڵەرەوانی مێژوو بە بێ ئەوەی پشكنینی بۆ بكەن‌و بیخەنە نێو كەو و بێژینگی ڕەخنەی زانستیانەوە، ئەم درۆو دەلەسەیەیان هەڵگرتۆتەوەو لەنێو كتێبەكانی خۆیان خزاندووە، كار بەوە گەیشتووە لە لای مێژوونووسە تازەكان ببێتە شتێكی سەلمێنراوی وا دەرفەتی وتوویژكردنی لەسەر نەبێت، بەڵام لە یەك گێڕانەوەشدا صەحیح بوونی نەچەسپاوەو ئەوەی لە كتێبەكانی (الدمیري، الیعقوبي ،أبي الفرج الأصفهاني)یشدا هاتووە جێگەی پشت پێ بەستن نین، چونكە مێژووی

---

١ سیر أعلام النبلاء (١٤٧/٥).

٢ المیزان (٤١٩/٣).

٣ دفاعاً عن السلفیة (ص: ١٨٧).

ڕاستو دروستو ڕیوایەتە صەحیحەكان جەخت لەسەر پێچەوانەی ئەوە دەكەنەوە كە ئەوان باسی دەكەن.[١]

مێژووی ڕاست دەڵێت: (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) ڕێزو حورمەتی زۆری بۆ (عەلی)ی ئەمیری ئیماندارانو خانەوادە پاكیزەكەی هەبووەو حیكایەتی نەفرینكردنی لەسەر مینبەرەكانی (بەنی ئومەییە) لەگەڵ لۆژیكی ڕووداوەكانو سروشتی دژایەتیەكان یەك ناگرێتەوە، ئەگەر بێتو بگەڕێینەوە بۆ ئەو كتێبە مێژووییانەی لە سەردەمی (ئومەوی)دا نوسراونەتەوە هەرگیز نابینین شتێكی لەم جۆرەیان باس كردبێت، بەڵكو لەو كتێبانەدا دەیبینین كە دواترو لە سەردەمی (خیلافەتی عەباسی)دا نوسراون، ئەم مێژوونووسانە بە ئامانجی لەكەداركردنی سومعەو ناوبانگی ئومەویەكان لەبەر چاوی موسڵمانان ئەمەیان كردووە، (مەسعودی) شیعە مەزەب لە (مروج الذهب)ەكەیداو چەند مێژوونووسێكی دیكەی شیعە ئەمەیان نوسیوەو پاشان ئەم درۆیە وەكو پەتا تەشەنەی كردووەو خزێنراوەتە نێو كتێبە مێژووییەكانی (ئەهلی سوننەتو جەماعەت)ەوە، بەڵام خۆشبەختانە یەك ڕیوایەتی صەحیحو ڕاشكاویان نەهێناوە، بێگومان پڕوپاگەندەیەكی لەم جۆرە پێویستی بە ڕاستو دروستی گواستنەوەو ساغ بوونی زنجیرەی سەنەدی ڕاویەكانیو خودی دەقی هێنراو دەكات، ئەمە لە كاتێكدا چۆنیەتی: كێشانەو پێوانەی ڕیوایەتێكی ئاوا بە لای توێژەرەوانو لێكۆڵەرەوانەوە زانراوە، لە لایەكی ترەوە بە حوكمی ئەوە (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) كەسایەتیەكی پایە بڵندو دیندار بوو و، ڕەفتاری جوامێرانەی لە بەرانبەر ئۆممەتدا نواندوونو ژمارەیەك لە هاوەڵانو تابعین ستایشیان كردووەو شایەدی دینداریو زانیاریو دادپەروەریو دڵو دەروون فراوانیو تەواوی سیفەتە ڕەندەكانیان بۆ داوە، زۆر لەوە گەورەترە شتی ئاوای لێ دەركەوێت، بەڵكو دەڵێین حاشاوەللە (معاویە) زۆر لەو تۆمەتانەوە دوورە.[٢] كەسێكیش وەكو (معاویە) خاوەنی ئەم سیفەتە بەرزانە بێتو هەموو ئەو كارو هەڵوێستە جوامێرانەی لە مێژوونامەكەیدا تۆمار كرابن، مەحاڵە خەڵك لە دژی كەسێكی وەكو (عەلی)ی كە لە خۆی پایەدارتر بووە، هان بداتو پێیان بڵێ لەسەر مینبەرەكانەوە جنێوی پێ بڵێنو نەفرەتی لێ بكەن، هەر كەسێك شارەزای مێژوونامەی سەردەمی حوكمڕانی (معاویە) بێتو بزانێت كە ئەم پیاوە چەند ئاقڵو دڵو دەروون فراوان بووەو، چەند بە ڕێكوپێكی كاروباری موسڵمانانی

---

١ (الحسن والحسين)، محمد رضا (ص: ١٨)، كلام المحقق، د. أحمد أبو الشباب.

٢ الانتصار للصحب والآل، للزحيلي (ص: ٣٦٧).

بەڕێوەبردووە، بۆی دەردەکەوێت کە ئەم پڕوپاگەندەیە گەورەترین بوختانەو لە دژی هەڵبەستراوە، (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) لە ئاوەزو نەرمو نیانی‌و سەماحەتدا بووەتە پێشەنگی نەوەکانی دوای خۆی‌و تا دنیا دنیایە بە نموونەو پەند دەهێنرێتەوە.[١]

ئەو ڕیوایەتەش کە لە (صەحیحی موسلیم)دا هاتووەو شیعەکان دەیانەوێت بوختانەکەی خۆیانی پێ پشتڕاست بکەنەوە، هەرگیز نابێتە بەڵگەی ڕاستی بیروبۆچوونەکەیان، لە (عامری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص) لە باوکیەوە، وتی: (معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان) فەرمانی بە (سەعد) کردو وتی: چ شتێك ڕێی لێ گرتووی قسە بە (ئەبا تراب) بڵێی؟ وتی: چونکە سێ شتم بیرکەوتنەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) باسی لێوە کردن، یەکێك لەو سێ شتەم بە لاوە خۆشەویستترە لە ڕەوە وشترێکی سورباو، بۆیە ئامادە نیم قەت قسە بە (عەلی) بڵێم.[٢]

(النووي) دەڵێت: وتەکەی (معاویە) ئەوەی لەخۆ نەگرتووە کە فەرمانی بە (سەعد) کردبێت جنێو بە (عەلی) بڵێت، نەخێر ئەو تەنها پرسیاری لە هۆکاری قسەپێنەگوتنەکەی ئەو کردووە، وەکو ئەوە دەڵێت: ئایا لەبەر لەخواترسان‌و خۆپارێزیتە یان شتێکی ترە؟، ئەگەر لەبەر لەخواترسان‌و خۆپارێزی ئەمە نەکەی ئەوا تۆ هەقت پێکاوەو چاکەکاری، لەوانەیە ((سەعد) (خودا لێی ڕازی بێت) لەگەڵ تاقمە کەسێك بووبێت، ئەوان قسەیان بە (عەلی) گوتبێ‌و ئەمیش خۆی پاراستبێت‌و نەشیتوانیبێت ڕەخنەیان لێ بگرێت‌و ڕێگریان بکات، جا (معاویە)ش سەبارەت بەمە پرسیاری لێ کردبێت.

وتوویانە لێکدانەوەیەکی تریش هەڵدەگرێت: کە بەم شێوەیەیە: لە کاتێکدا جوانی‌و ڕێکوپێکی ڕاو ئیجتیهادی ئێمە بۆ خەڵك دەخەیتەڕوو، باشە چ شتێك ڕێت لێ دەگرێت ڕاو ئیجتیهادەکانی (عەلی) بە هەڵە دانێیت‌و بۆ خەڵکیان ڕوون بکەیتەوە؟[٣]

(أبو العباس القرطبي)ی خاوەنی کتێبی (المفهم) دەڵێت: (زوراری کوڕی صودانی) لە مەجلیسی (معاویە)دا وەسفو ستایشی (عەلی) دەکات، (معاویە) قسەکانی بە ڕاست دادەنێت‌و بۆ (عەلی) دەگریا، جا (قورتوبی) لە پەراوێزی ئەمەدا دەڵێت: ئەم ڕیوایەتە دەبێتە بەڵگە کە (معاویە) دەرکی بە سەروەری‌و لەسەر هەقبوونی (عەلی) کردووەو زانیویەتی چەند بەرزو پایەدار بووە، لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە دوورە (معاویە) نەفرینی لێ کردبێت‌و

---

١ خامس الخلفاء الراشدين الحسن بن علي بن أبي طالب (ص: ٣٥٣).

٢ مسلم، كتاب: فضائل الصحابة (٤/١٨٧١).

٣ شرح صحيح مسلم (١٥/١٧٥).

بەخراپە باسی کردبێت، لە کاتێکدا کەسێکی وەکو (معاویە) کە بە تەواوی سیفەتەکانی ئاوەزو ئایینو نەرمونیانیو بەخشندەییو تەواوی ڕەوشتە جوانو بەرزەکانی تر وەصف کراوە، خودی ئەم وەصفانە بەرپەرچی ئەو ڕیوایەتانە دەدەنەوەو دەری دەخەن کە درۆو دەلەسەو بوختانو فریان بەسەر ڕاستیەوە نیە، ڕاسترین قسەی (معاویە) لەم بوارەدا ئەم وتەیەتی کە ئاراستەی (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص)ی کردووەو پێی وتووە: چ شتێك نایەڵێت قسە بە (ئەبا توراب) بڵێی؟ ئەمە ڕێگەپێدانی قسەپێگوتنی لەخۆ نەگرتووە، بەڵکو تەنها پرسیارێکە سەبارەت بە زانینی هۆکاری قسەنەکردنی (سەعد) بە (عەلی)، کاتێك (سەعد) وەڵامی دایەوەو هۆکارەکەی بۆ خستەڕوو، (معاویە)ش ئارام بوو و زانی هەق بە کێیە.[1]

(د. زوحەیلی) لە کتێبی (الصحب والآل)دا دەڵێت: خودا چاکتر دەزانێت، بەڵام ئەوەی بۆ من دەرکەوتبێت ئەوەیە: (معاویە) تەنها لە ڕووی گاڵتەو شۆخیەوە ئەم وتەیەی بە (سەعد) وتووەو ویستوویەتی بەم شێوازە هەندێك سەروەریو پیاوەتی (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت)ی بۆ دەربخات، چونکە (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) پیاوێکی زیرەكو بیرتیژ بوو، حەزی دەکرد لە ڕێی ڕاتەکاندنی خەڵکەوە شتی تازە فێر ببێت، لێرەدا ویستوویەتی بزانێت (سەعد) سەبارەت بە (عەلی) چ شتێکی زیادی پێیە، بۆیە بەم شێوازە هەستبزوێنەو وروژێنە پرسیارەکەی خۆی بۆ خستەڕوو، ئەمە وێنەی ئەم وتەیەتی کە ئاراستەی (عبدالله ی کوڕی عەباس)ی کردو وتی: تۆ لەسەر خەتی عەلی؟ (عبدالله) وتی: نەخێر، لەسەر خەتی (عوسمان)یش نیم، بەڵکو لەسەر خەتی پێغەمبەری خودا (ﷺ)م.[2] وەکو دیارە لێرەدا قسەکەی (معاویە) لە بەرانبەر (إبن عباس)دا بە شێوازی شۆخیو گاڵتە بووە، هەروەها ئەو قسەی بە (سەعد)یشی وت هەر دەچێتە ئەم بوارەوە، بەڵام ئەوەی (شیعە) پڕوپاگەندەی بۆ دەکات، ئەوە حاشایەکی (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) شتی ئاوا قێزەونی لێ دەرکەوتبێت.[3] چەند شتێکی گرنگ دەبنە بەربەست لە بەرانبەر ڕوودانی ئەمە:

١ـ (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) بۆ خۆی قسەی بە (عەلی) نەگوتووە تا فەرمان بە خەڵکانی تر بکات ئەمە بکەن، نەخێر، بەڵکو دانی بەوە دادێنا کە (عەلی) لە ئەو گەورەترو لەپێشترەو خاوەن سابیقەیە لە ئیسلامدا، (إبن کثیر) وتی: لە چەند ڕێیەکەوە پێمان

---

١ المفهم، للقرطبي (٦/٢٧٨).

٢ الإنابة (١/٣٥٥)، شرح أصول الإعتقاد للألكائي (١/٩٤).

٣ الانتصار للصحب والآل، للزحيلي (ص: ٣٧٥).

گەیشتووە کە: (أبو مسلم الخولانی)و کۆمەڵە کەسێك دەچنە لای (معاویە)و پێی دەڵێن: تۆ کێبەرکەی (عەلی) دەکەی یان پێت وایە شان لە شانی دەدەی؟ وتی: وەڵڵاهی دەزانم کە ئەو بە چەند قات لە من چاکترەو سەروەرترەو بۆ پۆستی خیلافەت لە من شایانترە.[١]

(جریری کوڕی عبدالحمید) لە (موغیرە)وە وتی: کاتێك هەواڵی کوژرانی (عەلی) بە (معاویە) گەیشت، دەستی بە گریان کرد، هاوسەرەکەی پێی وت: ئەوە بۆی دەگریەی؟ خۆ تۆ شەڕت لەگەڵ کردووە؟ وتی: وای بۆ تۆ، نازانی کە خەڵك چەندەیان چاکەو فیقهو زانست لە دەست دەرچوو.[٢]

کەواتە کە بیروباوەڕی (معاویە) لە بەرانبەر (عەلی)دا ئاوا بووبێت، چ ئەقڵو دینێك ڕێی پێ دەدات قسەی پێ بڵێت یان خەڵك هاندا قسەی پێ بڵێن؟![٣].

٢- بە گوێرەی هیچ ڕیوایەتێکی (صەحیح) نەزانراوە کە (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) لە کاتەکانی شەڕی گەڵ (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت)داو لە کاتێکدا کە (عەلی) لە ژیاندا بووبێت، قسەی بە (عەلی) وتبن، باشە چۆن ئەقڵ قبوڵی دەکات دوای کۆتایی هاتنی شەڕو کۆچی دوایی کردنی قسەی پێ بیڵێت! ئەمە لە لای خەڵکی ئاقڵ بە دوور دەزانرێت، فەرمانکردنی بە خەڵکیش کە قسەی پێ بڵێن بە دووتر لەمە دەزانرێت.

٣- (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) بە ئەقڵو زیرەکیو لێزانی ناوبانگی دەرکردبوو، باشە ئەگەر بیویستبایە خەڵك هەڵنێ تا قسە بە (عەلی) بڵێن (کە حاشا ئەو ئەمەی کردبێت)، چۆن پێش هەموو کەس داوا لە کەسایەتیەکی وەکو (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص) (خودا لێی ڕازی بێت) دەکات کە لە ئازایەتیو پایەبڵندیو خۆپارێزیدا لە پێش ئەوەوە بوو و، وێرای ئەمەش ئەسڵەن خۆی لە ئاشوبو شەڕ هەڵنەقورتاندبوو، ئەگەر کەسێك تۆزقاڵە ئاوەزو بیرکردنەوەیەکی هەبێت کارێکی لەم جۆرە ناکات، جا چ جای کەسێکی وەکو (معاویە) ئەمەی کردبێت، دوابەدوای دابەزینی (حەسەنی کوڕی عەلی) (خودا لێیان ڕازی بێت) لە پۆستی خیلافەت، (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) بە تەنهاو بێ ڕکەبەر ئەم پۆستەی وەرگرتو هەموو ئوممەت دەنگیان پێداو شارو وڵاتەکان گەردنکەچی بوون.

---

١ البداية والنهاية (١٣٣/٨).

٢ المصدر نفسه (١٣٣/٨).

٣ الانتصار للصحب والآل، للرحيلي (ص: ٣٧٦).

٤ـ دوای ئەمە قسەگوتن بە (عەلی) چ سودێکی بۆ ئەو تێدایە؟، سیاسەتو حیکمەت بەخاتریدامرکاندنەوەی ڕقوقینەکان و ئارامکردنەوەی دڵو دەروونەکانو جێگیرکردنی کاروبارەکان پێچەوانەی ئەم هەڵوێستە دەخوازن ، بێگومان کە کەسێکی وەکو (معاویە)ی سیاسەتمەدار ئەمەی زانیوە.

٥ـ وەك لەنێو کتێبەکانی مێژوو و سیرەدا مەشهورە، (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) دوای بوونی بە (خەلیفە) پەیوەندیەکی توندوتۆڵی خۆشەویستانەو خزمانەی لەگەڵ کوڕەکانی (عەلی) گرێداوەو تاکو بڵێی نێوانیان خۆش بووە.[1] نموونە لەسەر ئەمە، (حەسەنو حوسەین) سەردانی معاویەیان کرد، دەستبەجێ دووسەد هەزاری خەڵات کردنو پێی وتن: پێش من کەس خەڵاتی ئاوای نەکردوون (واتە کەس بەم چەشنە لوتفو خۆشەویستی لە گەڵ نەنواندوو)، (حوسەین) پێی وت: لە ئێمە باشتر نایدەی بە کەسی تر.[2]

جارێك (حەسەن) دەچێتە لای معاویەو بەم شێوەیە پێشوازی دەکات: خۆش هاتی بۆ ماڵی خۆت، کوڕی کیژی پێغەمبەری خودا (ﷺ)، فەرمانی کرد سێ سەد هەزاری پێ بدرێت،[3] ئەم ڕیوایەتانە هەموو ئەو درۆو دەلەسانە لە ڕەگو ڕیشە هەڵدەتەکێنن کە دەرهەق بە معاویەو سەبارەت بەوە خەڵکی بۆ قسەگوتن بە (عەلی) هاندابێت کراونو هەڵبەستراون. لە حاڵێکدا نێوانی لەگەڵ ڕۆڵەکانی بەم شێوەیە خۆش بووبێتو هێندەی ڕێز لێنابن، چۆن لە لایەکی ترەوە کاری لەم شێوەیە دەکات!، بەم شێوازە سەبارەت بەم مەسەلەیە هەق سەردەکەوێتو وەکو ڕۆژی ڕووناك دەزرنگێتەوە.[4] هەروەك چۆن تاکەکانی کۆمەڵگای ئەو کاتە بە شێوەیەکی گشتی پابەندی حوکمە شەرعیەکان بوونو سووربوون لەسەر جێبەجێکردنیان، لەبەر ئەمە لە هەموو خەڵکانی تر لە تانەوتەشەرو توانجو پلارو جنێودانو دەمشڕی دوورترو خۆپارێزتربوون.[5] پێغەمبەری خودا (ﷺ) نەیهێشتووە قسە بە مردووی بتپەرستان بوترێت، جا دەبێ چۆن ڕێ بەو قسانە بدرێت کە دەرهەق بە دۆستانی چاکەخوازی خودا دەگوترێن، لە (عائیشە)وە (خودا لێی ڕازی بێت) وتی: پێغەمبەر (ﷺ)

---

١ الانتصار للصحب والآل، للزحيلي (ص: ٣٧٦).
٢ البداية والنهاية (٨/١٣٩).
٣ البداية والنهاية (٨/١٤٠).
٤ الانتصار للصحب والآل، للزحيلي (ص: ٣٧٧).
٥ صحيح إبن حبان، قم (٤٧). الصحيحة للألباني، رقم (٣٤٠).

فەرمووی: ((لا تسبوا الأموات فإنهم قد أفضوا الى ما قدموا))[1] واتە: جنێو بە مردووان مەدەن، چونکە ئەوان گەڕاونەوە بۆ پاداشتو سزای کردەوەو گوفتارەکانی خۆیان کە لە دونیادا ئەنجامیان داون.

## پێنجەم: معاویەو تۆمەتی ژارخواردکردنی حەسەنی کوڕی عەلی:

بە گوێرەی هەندێك ڕیوایەت (حەسەنی کوڕی عەلی) ژەهرخوارد کراوەو، بەم هۆیەوە کۆچی دوایی کردووە، بە خاتری ئەمە پەنجەی تۆمەت ئاڕاستەی (جەعدەی کچی ئەشعەثی کوڕی قەیسی ئەمیری کیندە)ی هاوسەری (حەسەن) کراوە، (أم موسی)ی کەنیزەکی (عەلی) (جەعدە) بەمە تاوانبار دەکاتو دەڵێت: حەسەنی ژەهرخوارد کرد، ئازارێکی زۆری لە جەستەدا گەڕا، تا ماوەی چل شەوو ڕۆژ بەردەوام بۆ ساردکردنەوەی تایەکەی تەشتێکی لە ژێر دادەناو کە گەرم دەبوو بۆی دەگۆڕی،[2] ئەم ڕیوایەتە لە ڕووی سەنەدەوە لاوازوپەڕپووتە، فڕی بەسەر ڕاستیەوە نییە.[3]

هەندێك لە حیکایەتخوانەکان ویستوویانە پردێك لە نێوان بەیعەتی (یەزید)و مەرگی (حەسەن) دروست بکەن و ،دایانناوە کە گوایە: (یەزیدی کوڕی معاویە) وەڵامی بۆ (جەعدە) ناردووە: ژەهر دەرخواردی ((حەسەن) بدە، کە مرد من دەتخوازم، ئەویش ئەمەی کرد، کاتێك (حەسەن) مرد، (جەعدە) وەڵامی بۆ (یەزید) نارد تا بەڵێنەکەی بەرێتە سەر، وەڵامی بۆ ناردەوەو وتی: ئێمە بۆ ئەومان پێ پەسەند نەبووی، جا چۆن بۆ خۆمانت پەسەند دەکەین؟!.[4]

(یەزیدی کوڕی عیاضی کوڕی جەعدبە) لەنێو سەنەدی ئەم ڕیوایەتەدایەو، (مالیك)و چەند زانایەکی تریش بە (درۆزن)یان داناوە،[5] ئەم ڕیوایەتانە (بەبێ هەڵسەنگاندنو پاڵفتەکردن) خۆیان خزاندووەتە نێو کتێبەکانی (ئەهلی سوننەتو جەماعەت)ەوە، لەگەڵ ئەوەدا زانراوە کەسەنەدی هەرهەموویان زەعیفو لاوازە.[6]

---

١ البخاري، رقم (٦٥١٦).
٢ الطبقات، تحقيق السُّلمي (٣٣٨/١) إسناده ضعيف.
٣ المصدر نفسه (٣٣٨/١).
٤ تهذيب الكمال (٤٥٣/٦).
٥ تقريب التهذيب (ص: ٦٠٤).
٦ مرويات خلافة (معاوية) في تاريخ الطبري (ص: ٣٩٣).

١ـ (إبن العربي) دەڵێت: ئەگەر بگوترێت: کەسێکی وەکو (معاویە) کەسێکی هانداوە حەسەن ژەهرخوارد بکات، دەڵێین: ئەمە لە دوو ڕووەوە مەحاڵە: یەکەمیان: ئەو لەوە نەدەترسا لە لایەن (حەسەن)ەوە زەبرێکی بەربکەوێت، چونکە (حەسەن) جڵەوی دەسەڵاتی ڕادەستی ئەو کردبوو. دووەم: ئەمە ڕازێکی شاراوەیەو جگە لە خودا کەس نازانێت، باشە چۆن بە بێ بەڵگەو شایەد ئەم تۆمەتە دەخەنە پاڵ کەسێك کە ماوەیەکی دوورو درێژ لە نێوان ئێمەو ئەودایە، ئێمە بڕوا بە ڕیوایەتی کەسانێکی بێ بەندو باری ئارەزووبازی سەردەمی ئاشوبو دەمارگیریش ناکەین کە بە ئارەزووی خۆیان چ شتێك نادروست بووبێت هەڵیانبەستبێت، جگە لە ڕیوایەتی پاكو پوختو ڕوونو صاف هیچ شتێکی ئەو سەردەمە وەرناگیرێتو، جگە لە کەسانی ڕاستگۆو دادپەروەری دامەزراویش قسەی کەسانی تری تێدا قبوڵ ناکرێت.[1]

٢ـ (إبن تيمية) دەڵێت: بەڵام ئەو قسەیەی کە گوایە: (معاویە) (حەسەن)ی ژەهرخوارد کردووە، ئەمە ئەوەیە کە هەندێك کەس باسی دەکەن، بە بەڵگەی شەرعیو دان پێداهێنانێکی حیساب بۆکراو شێوە ڕیوایەتێکی دڵنیاکەر نەچەسپاوە، ئەمە دەچێتە بواری شتێك کە زانیاری لەسەر نەبێت، قسەکردن لەسەری قسەکردنی بێ زانیاریە.[2] ئەمەو (إبن تيمية) بەرپەرچی ئەو تۆمەتانە دەداتەوەو یەکێك لەو ڕیوایەتانە دێنێتو بەم جۆرە لێکی هەڵدەوەشێنێت: گوایە: (معاویە) فەرمانی بە (ئەشعەسی کوڕی قەیس)ی خەزووری (حەسەن) —واتە باوکی ژنەکەی— کردبێت ئەم تاوانە ئەنجام بدات، (إبن تيمية) وتی: ئەگەر بگوترێت (معاویە) فەرمانی بە باوکی (جەعدە) کردبێت، ئەوە گومانێکی بەدی ڕووتە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((إياكم والظن، فإن الظنَّ أكذب الحديث)) واتە: خۆ لە گومان—ی بەد— بەدوور بگرن، چونکە بەدگومانی گەورەترین درۆیە. ئەمجا (ئەشعەسی کوڕی قەیس) ساڵی چل کۆچی دوایی کردووە، دەشگوترێت لە چلو یەکدا مردووە، لەبەر ئەمە ناوی لە صوڵحەکەی نێوان (حەسەنی کوڕی عەلی)و (معاویە)دا نەهاتووە، ئەگەر ئەو ئامادەی صوڵحەکە بووایە باسی دەکراو ناوی دەبرا، جا ئەگەر ئەشعەس بە دە ساڵ بەر لە مردنی (حەسەن) مردبێت چۆن فەرمانی بە کیژەکەی کردووە حەسەن ژارخواردوو بکات؟![3].

---

١ العواصم من القواصم (ص: ٢٢٠ـ٢٢١).

٢ منهاج السنة النبوية (٤/٤٦٩).

٣ المنتقى من منهاج الإعتدال (ص: ٢٦٦).

ئەمە دەبێتە بەڵگە کە (إبن تیمیة) دەستێکی باڵای لە هەڵسەنگاندنی زانستیانەی ڕیوایەتە مێژووییەکاندا هەبووە.

٣ـ (الذهبي) دەڵێت: وتم: ئەمە شتێکی ناڕاستە، بڵێن کێ ئاگای لەمە بووە؟[١]

٤ـ (إبن كثير) دەڵێت: هەندێکیان ڕیوایەتیان کردووە کە: (یەزیدی کوڕی معاویە) وەڵامی بۆ (جەعدەی کچی ئەشعەث) ناردووە: حەسەن ژارخواردوو بکە، دوای ئەو من دەتخوازم، ئەویش ئەم کارەی کرد، جا کاتێك (حەسەن) مرد، (جەعدە) وەڵامی بۆ نارد، (یەزید) وتی: بە خودا ئێمە بۆ (حەسەن)مان بە لاوە پەسەند نەبووی، جا چۆن بۆ خۆمانت پەسەند دەکەین؟. ئەمجا (إبن كثير) دەڵێت: ئەمە بە لای منەوە صەحیح نیە کە یەزید کارێکی لەم جۆرەی کردبێت، ئەوە هیچ کە ئەم تۆمەتە بە نیسبەت باوکیەوە کە هەرگیزاوهەرگیز ڕاست نیە.[٢]

٥ـ (إبن خلدون) دەڵێت: ئەو ڕیوایەتەی کە دەڵێت: (معاویە) لە ڕێی (جەعدەی کچی ئەشعەث)ەوە (حەسەن)ی ژارخواردوو کردووە، یەکێکە لە ڕیوایەتەکانی (شیعە)، حاشایەکی (معاویە) کارێکی ئاوای کردبێت.[٣]

٦ـ (د. جميل المصري) بەم جۆرە قسە لەسەر ئەم مەسەلە دەکاتو دەڵێت: .... ئەمجا مەسەلەی ژارخواردکرانی (حەسەن) لە لایەن (معاویە) یان (یەزید)ەوە وروژێنرا.... وەکو دیارە ئەو مەسەلە لەو سەردەمەدا لە ئارادا نەبووە، چونکە بە هیچ شێوەیەك شوێنەواری ئەم مەسەلە لە ڕاپەڕینەکەی (حوسەین)دا بەدی ناکرێت.[٤] هەتا ئەوەی نابینین (حوسەین) قسەیەکی لەسەر ئەمە هەبێتو گلەییەکی سادەشی ئاڕاستەی (معاویە) کردبێت، هەرچەندە لاموجیم لە ژارخواردکرانی (حەسەن) (خودا لێی ڕازی بێت) ناکەین، ئەگەر چەسپا بە ژەهر مردووە، ئەوە بۆی دەبێتە شەهادەتو ڕێزلێگیرانی.[٥] بەڵام وەکو ڕابوری لە ڕووی (سەنەد)و (مەتن)ی ڕیوایەتەکانەوە تۆمەتبارکرانی (معاویە)و (یەزید) ناسەلمێنرێت، ئایا (جەعدەی

---

١ تاريخ الإسلام، عهد (معاوية) (ص: ٤٠). إتهامات لا تثبت، سليمان بن صالح الخراشي (ص: ١٧٤).

٢ البداية والنهاية (٨/٤٣).

٣ تاريخ إبن خلدون (٢/٥٢٧).

٤ أثر أهل الكتاب في الفتن والحروب الأهلية (ص: ٤٨٢)، مرويات خلافة (معاوية) (ص: ٣٩٥).

٥ منهاج السنة (٤/٤٢).

کچی ئەشعەث) لەم کارەیدا (وەکو ڕیوایەتەکان باسی لێوە دەکەن) پێویستی بە سەروەت‌و پلەو پایە بووە تا ئارەزووی (یەزید) بەجێ بگەیەنێت‌و پاشانیش ببێتە هاوسەری؟، ئایا بەس نەبوو کە ئەو کچی (ئەشعەثی کوڕی قەیس)ی سەرۆك هۆزی (کیندە)یە، ئایا (حەسەنی کوڕی عەلی) هاوسەری شکۆدارترین کەسی بێ وێنەو بێ ڕکابەری نێو خەڵکی ئەو سەردەمە نەبوو، ئەوەندە شانازیەی بەس بوو کە بابە گەورەی (حەسەن)ی هاوسەری، بریتی بوو لە پێغەمبەری خودا (ﷺ)، دایکی بریتی بوو لە (فاطمة)ی کچی پێغەمبەری خودا (ﷺ)، (عەلی کوڕی ئەبو تالیب)یش باوکی بوو و، یەکێك بوو لە دە کەسە موژدەپێدراوەکانی بەهەشت‌و چوارەمین خەلیفەی ڕاشید بوو، واتە (جەعدە) بە هۆی چی‌و بە خاتری گەیشتن بە چی‌و چ دەستکەوتێك–ی گەورەتر لەمانە– هەستاوە بە ئەنجامدانی کردارێکی هێندە سامناك؟!.[١]

ئەلێرەدا زۆرێك لە دوژمنانی یەکێتی‌و یەکپارچەیی ئوممەتی ئیسلام، بەهۆی ئەنجامدانی صوڵحەکەی گەڵ (معاویە)، ڕقیان لە (حەسەن) هەستاوەو، بە بڕوای خۆیان هەتا (حەسەن) لە ژیاندا بمێنێت، هێمنایەتی‌و ئاسایشی جیهانی ئیسلام جێگیر دەبێت،کە ئەو ئێستا بەبێ ڕکابەر بۆتە ئیمامی ئاشتەوایی‌و تەبایی‌و یەکێتی‌و پێکەوە جۆشدانی ئوممەت، بۆیە لە پێناوی گێڕانەوەی بارودۆخی پێشداو هەڵایسانی ئاشوب‌و شەڕو هەرا، پێویستە (حەسەن) لەنێو ببرێت، جا بە بیروڕای من ئەگەر حسن بەمردنی نائاسایی کۆتایی بە ژیانی هاتبێ ئەوا دەبێ تاوانبارو تۆمەتباری پلە یەك ئەو (سەبەئی)یانەبن کە شوێنکەوتووی (عبدالله ی کوڕ سەبەء)بوون، چونکە(حەسەن) بە هۆی ئەنجامدانی صوڵحەکەی گەڵ (معاویە) گەورەترین گورزی گورچوبڕی ئاڕاستەی ئەوان کردو چالاکیەکانی سنووردارکردن، ئەمجا بە پلە دوو دەبێ ئەو (خەواریج)انە بن کە (عەلی کوڕی ئەبو تالیب)ی ئەمیری ئیماندارانیان شەهید کردبوو و خودی حەسەنیشیان غافڵگیر کردبوو و–لە مەدائین– ڕمبێکیان لە ئەژنۆ گرتبوو، لەوانەیە بە هۆی ئەنجامدانی تاوانێکی لەم جۆرە–ئەگەر کردبێتیان– ویستویانە تۆڵەی کوژراوەکانی (نەهرەوان)و شوێنەکانی تریان بکەنەوە.[٢]

---

١ مواقف المعارضة في خلافة يزيد بن (معاوية) (ص: ١٢٣).

٢ المصدر نفسه (ص: ١٢٤).

## شەشەم: بکوژەکانی عوسمان ( خودا لێی ڕازی بێت )و هەڵوێستی ( معاویه ) ( خودا لێی ڕازی بێت ) لە بەرانبەریاندا:

یەکێك لەو مەرجانەی (حەسەن) لە صوڵحەکەدا لەسەر (معاویه)ی دانان ئەمە بوو کە هیچ شتێك لە هیچ کەسێکی دانیشتوانی (مەدینەو حیجازو عێراق) داوا نەکات.[١] مێژوونووس تێبینی ئەوە دەکات کە داوای تۆڵەی خوێنی عوسمان لەو سەردەمەدا وازی لێ هێنراوە،[٢] ئەمەو ڕێککەوتن لەسەر ئەوە کە نابێت کەس بە هۆی کردارێك کە لە سەردەمی (عەلی)یدا ئەنجامیداوە لێپێچینەوەی لەگەڵ بکرێت، ئەم خاڵە بنەمایەکی یەجگار گرنگ بوو و، بوو بە مایەی ئاوڕنەدانەوە بۆ ڕابوردوو و هەڵدانەوەی لاپەڕەیەکی تازەی وا جەخت لەسەر ئێستاو ئاینده بکاتەوە.[٣]

هەردووکلا لەسەر پابەندبوون بە مەرجەکانی نێوانیانەوە پێکهاتن‌و صوڵحەکە لەسەر بنەمای لێبوردنی گشتی ڕەها بۆ هەر شتێك لە پێش ئەنجامدانی صوڵحەکە ڕوویداوە لە لایەن هەر کەسێکەوە ئەنجام دراوە تەواو بوو، ئیتر (معاویه) کەسی لەسەر تاوانەکانی بەر لە (صوڵح) نەگرت‌و سزا نەدا، صوڵحەکەی حەسەن لە چاکەو لێبوردندا بوو بە پێشەنگی صوڵحەکان‌و، هێمنایەتی‌و پاراستنی خوێن لەسەردەمی معاویەدا بە تەواوەتی باڵی بەسەر بارودۆخی جیهانی ئیسلامیدا کێشا.[٤] لە کتێبی (عیون الاخبار)ی (إبن قتیبة)دا هاتووە: هەر کە (معاویه) لە ساڵی (جەماعە)دا گەیشتە (مەدینە)، چووە ماڵی (عوسمانی کوڕی عەفان)، (عائیشەی کچی عوسمان) قیژاندی‌و گریاو بانگێکی بۆ باوکی لێدا، (معاویه) وتی: هۆ برازای خۆم، خەڵك دەستی فەرمانبەرداریان پێداوین، ئێمەش بەڵێنی چەپاڵەدانمان پێداون، تووڕەیی خۆمان پەنهان کردووەو نەرمونیانیمان نیشانداون، ڕقی خۆیان شاردۆتەوەو گوێڕایەڵیان نیشان داوین، هەر کەسە شمشێری خۆی لە شانەو چاوی لە جێی هاوەڵەکانیەتی، ئەگەر ئێمە بەڵێنەکەمان بشکێنین ئەوانیش بەڵێنەکەیان دەشکێنن، نازانین بە دژی ئێمە یان بە بەرژەوەندی ئێمە تەواو دەبێت، ئەگەر کچی ئەمیری ئیماندارن بی باشترە لەوەی ببی بە کیژی یەکێك لەو خەڵکە.[٥] وا لە قسەی (إبن قتیبه) دەخوێنرێتەوە کە

---

١ التبيين في أنساب القريشيين (ص: ١٢٧).

٢ الخلفاء الراشدون للنجار (ص: ٤٨٢).

٣ الدور السياسي للصفوة في صدر الإسلام (ص: ٣٤١).

٤ خامس الخلفاء الراشدين الحسن بن علي (ص: ٣٤٩).

٥ دراسة في تاريخ الخلفاء الأمويين (ص: ٦٩)، السلطان لإبن قتيبة (ص: ٥٨).

کۆمەڵە بەڵێنو پەیمانێك لە نێوان (حەسەن)و (معاویە)دا بڕیاریان لەسەر دراوەو دەرەنجام بە هۆیانەوە شەڕو کوشتارو خوێنڕێژی کۆتایی پێ هێنراوەو ئاشتەوایی نێوان خەڵکیان پێکراوە، زیاد لەمە بە تێپەڕینی ئەو پێنج ساڵ لەسەر یەکەی جەنگەکانی (جەمەل و صەفین و نەهرەوان و مصرو هی تریش)ی تێدا ئەنجام دران، ناوی هەموو ئەو کەسانەش شوێنەون بوون کە بە کوشتنی (عوسمان) تۆمەتبار کرابوون، ئەمە لەگەڵ ئەوەدا کە کوژرانی عوسمان مەسەلەیەکی هێند گەورەو گران بوو هەمیشە لە زەینی خەلیفەکانی تری ئومەوی و جێگرەکانیاندا زیندوو بوو، خۆ پشتیوانیکردنی (بەنی ئومەییە) لە عوسمان ڕاستیەکی حاشاهەڵنەگرو بێگومان بوو.[1]

## حەوتەم: کوژرانی (حیجری کوڕی عەدی) (خودا لێی ڕازی بێت):

زۆرینەی سەرچاوەکان باسی کوژرانی (حجری کوڕی عەدی) (خودا لێی ڕازی بێت)یان کردووە، لە نێوانیاندا: (إبن سعد)[2]، (خلیفة بن خیاط)[3] زۆر بە کورتی، (البلاذري)[4]، (الیعقوبي)[5]، (المسعودي)[6]، (أبو الفرج الأصفهاني)[7] بە دوور و درێژی، (إبن الجوزي)[8]، (إبن الأثیر)[9] بە دوورو درێژی، (الذهبي)[10]، (إبن کثیر)[11]، هەرچی (الطبري)یە لە هێنانی هەواڵی کوژرانی (حجری کوڕی عەدی)و هاوڕێکانیدا پشتی بە (أبی مخنف)ی مێژوونووسی دیارو بەرچاوی شیعە بەستووە، کە بە لای زانایانی ئەهلی (سوننەت و جەماعەت)ەوە جێی بڕوا نیەو دروست نیە پشتی پێ ببەسترێت، ئەمەو (الطبري) شازدە ڕیوایەتی لێوە ڕیوایەت کردوون، بە شێوەیەکی گشتی هەواڵی کوژرانی (حجری کوڕی عەدی) تەنها لە سەرچاوەکانی (شیعە)وە نەهاتووە، بەڵکو سەرچاوەگەلێکی جۆراوجۆر هێناویانە، بەڵام ڕیوایەتەکەی (أبی

---

١ دراسة في تاريخ الخلفاء الأمويين (ص: ٧٠).
٢ الطبقات (٦/٢١٧)، تحقيق: إحسان عباس.
٣ التاريخ (صص: ٢١٣).
٤ أنساب الأشراف (٤/٢٤٢).
٥ تاريخ اليعقوبي (٢/٢٣٠).
٦ مروج الذهب (٣/١٢).
٧ الأغاني (١٧/١٣٣).
٨ المنتظم (٥/٢٤١).
٩ الكامل في التأريخ (٢/٤٨٨).
١٠ سير أعلام النبلاء (٣/٤٦٢).
١١ البداية والنهاية (١١/٢٢٧).

مخنف) بە لای زانایانی (الجرح والتعدیل)ەوە فڕێ دەدرێتو حیسابی بۆ ناکرێت، ڕیوایەتەکەی (أبی مخنف) ئاماژە دەدا بەوە کە گوایە (معاویه) (موغیرەی کوڕی شوعبە)ی ڕاسپاردووە جنێو بە (عەلی) بداتو زەمبی بکات، لەبەر ئەمە (موغیرە) بە درێژایی ساڵانی سەرۆکایەتیکردنی کاروباری (کوفە)ی لە وتارەکانیدا وازی لە زەمبکردنی (عەلی) نەهێناوە، ئەمجا (ئەبو مەخنەف) دەقی ئەو وتارەی (شوعبە) دێنێت کە (حیجری کوڕی عەدی) تووڕە کردووەو دەڵێت: (شوعبە) وتی: خودایە بەزەییت بە (عوسمان)دا بێتەوەو لێی ببوورە، لەسەر جوانترینو ڕێکوپێکترین کردەوەی ئەنجامیداوە پاداشتی بدەیتەوە، ئەو کاری بە کتێبەکەت کرد، بە دوای سوننەتی پێغەمبەرەکەت (ﷺ) کەوت، بڕیارەکانی یەکخستینو خوێنی لە ڕژان پاراستین، بە ستەملێکراوی کوژرا، خودایە بەزەییت بە پشتیوانو دۆستو خۆشەویستو داواکەرانی تۆڵەی خوێنی ئەودا بێتەوە، ئەمجا تووکو دوعای لە بکوژەکانی دەکردن،[1] ڕیوایەتەکە ئاماژە دەدات کە وتارەکە زەمبی (عەلی) تێدا کراوە، بەڵام وەکو تێبینی دەکرێت دەقی وتارەکە ئەمەی پێوە دیار نیە، مەگەر لەو حاڵەدا لەعنەتکردنی بکوژەکانی (عوسمان) بە (عەلی)و هاوەڵانی تەئویل بکرێت.[2] پاکی (عەلی)یش لە بەرانبەر ڕژانی خوێنی (عوسمان)دا خەڵکانی دوورو نزیك پێی ئاشنان، لەو کتێبانەی خۆمدا کە دەربارەی (عوسمان)و (عەلی)و (حەسەن) (خودا لێیان ڕازی بێت) نوسیومن ئەمەم سەلماندووە. هەرچۆنێك بێت، لێکۆڵەری کوژرانی (حیجری کوڕی عەدی) بەپێی ئەم ڕیوایەتە تێبینی دەکات، کە هەڵوێستی (حیجر) لە بەرانبەر (معاویە)ی ئەمیری ئیمانداران بە دوو قۆناغدا گوزەری کردووە:

**قۆناغی یەکەم: بەرهەڵستی گوفتاری: (٤٥ـ٥٠ کۆچی):**

(حیجری کوڕی عەدی کیندی) أبو عبدالرحمن الشهید، بە پلەی هاوەڵایەتیو سەردانکردنی پێغەمبەری خودا (ﷺ) گەیشتووە، لەگەڵ (هانیئی کوڕی أدبر)ی برای هاتۆتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)، هیچ فەرموودەی لە پێغەمبەر (ﷺ)ەوە ڕیوایەت نەکردوون، لە (عەلیو عەممار)[3]ەوە بە ڕێگەی بیستن زانیاری وەرگرتووە، پایەدار بووە، ئەمیرێك بوو گوێڕایەڵی لێدەکرا، فەرمانی بە چاکە دەکرد، ڕێگری لە خراپە دەکرد، لە ڕیزی هەوادارە

---

١ تأريخ الطبري (٦/١٦٨ـ١٦٩).

٢ أثر التشجيع على الروايات (ص: ٣٦٨ـ٣٧٠).

٣ سير أعلام النبلاء (٣/٤٦٢).

دڵسۆزەکانی (عەلی) بوو، بە سیفەتی فەرماندەیەکی سوپا ئامادەی جەنگی (صفین) بوو، چاکەخوازو خوداپەرست بوو،[١] بەرهەڵستی ئەو صولحەی دەکرد کە لە نێوان (حەسەن)و (معاویە) (خودا لێیان ڕازی بێت)دا ئەنجام درا، بەلاّم ئەم بەرهەڵستیەی لەم قۆناغەدا لە گوفتاردا کورت هەلاّتبوو سەری نەکێشا بۆ کردار،[٢] (البلاذري) سەبارەت بە ئەمە دەڵێت: (حیجری کوڕی عەدی) بەردەوام لاموجیمی لەگەڵ (حەسەنی کوڕی عەلی) دەکرد لە بەرانبەر ئەو صولحەی لەگەڵ (معاویە) ئەنجامی دابوو، لۆمەی دەکردو دەیوت: چل هەزار جەنگاوەری نیاز پاکت بە پشتەوە بوون، کە دەیانزانی چۆن جەنگ لەگەڵ دوژمنەکەت بکەن، کەچی وازت لە جەنگ هێنا، ئەمجا نەنگیەکانی (معاویە)ی باس دەکردنو بە ستەمکاری دادەنا، ئیدی ئەمە ببووە کارو پیشەی.

**قۆناغی دووەم: بەرهەڵستی کرداری:**

ئەم قۆناغە لە ساڵی (٥١)ی کۆچیدا لە کاتی تێکچوونی نێوانی حیجری کوڕی عەدی لەگەڵ (زیادی بابرای معاویە)ی والی (عێراق) بە شێوەیەکی کتوپڕ دەستی پێکرد، سەرچاوەکان تێکچوونی پەیوەندی ئەم نێوانە بۆ دوو هۆ دەگێڕنەوە:

أ‌- (وەك پێشدا باسکرا) (موغیرەی کوڕی شوعبە) ستایشی (عوسمان)ی دەکردو بۆی لە خودا دەپاڕایەوە بیخاتە بەر ڕەحمەتی خۆیەوەو زەمبی (عەلی کوڕی ئەبو تالیب)یشی دەکرد، لە بەرانبەردا (حیجری کوڕی عەدی) هەڵدەستاو ستایشی (عەلی) دەکردو زەمبی (عوسمان)ی کرد، (موغیرە) لە بەرانبەر (حجر)دا بێدەنگ دەبوو، جا کاتێك (موغیرە) کۆچی دوایی کردو (زیادی بابرای معاویە) بوو بە والی، ئەویش لە وتارەکانیدا وەکو (موغیرە) ستایشی (عوسمان)ی دەکردو زەمبی (عەلی) دەکرد، (حیجر)یش لە بەرانبەر(موغیرە)دا چی دەکرد، لە بەرانبەر (زیاد)یشدا ئەوەی دەکرد، ئەمە بوو بە سەرەتای تێکگیرانی نێوان (حیجر)و (زیاد).[٣]

ب ــ گوتراوە (زیاد) وتاری هەینی درێژ دەکردەوەو نوێژەکەی دەخستە درەنگیّ، (حیجر)یش ڕەخنەی ئەمەی لێگرتووە، بە هۆی ئەمە ڕووبەڕووبوونەوەی نێوانیان دەستی پێکرد،[٤] ئەم بەڵگانەی خوارەوە ئەم دوو هۆکارانەی باسکران هەڵدەوەشێننەوە.

---

١ المصدر نفسه (٣/٤٦٣).

٢ مرويات خلافة (معاوية) في تأريخ الطبري (ص: ٤٢٢).

٣ تأريخ الطبري (٦/١٦٩).

٤ تأريخ الطبري (٦/١٦٩).

- هەڵسوکەوتی (موغیرە) (خودا لێی ڕازی بێت) لە بەرانبەر دانیشتوانی (کوفە) بە لێبوردن‌و چاوپۆشی‌و سینگفراوانی ناوی دەرکردبوو، نەك بە ورووژاندنی ڕق‌و قینەو کولاندنەوەی کۆنە برینان، بەڵگە لەسەر ئەمە: (بوخاری) لە ڕێگای (زیاد کوڕی علاقە)وە ڕیوایەت دەکات‌و دەڵێت: لەو ڕۆژەدا (موغیرەی کوڕی شوعبە) کۆچی دوایی کرد، گوێم لە (جریری کوڕی عبدالله) بوو، هەستایە سەرپاو سوپاس‌و ستایشی خودای کردو وتی: هەتا ئەمیرێکتان بۆ دێت کە بڕیارە ئێستا بێت، پابەند بن‌و خۆ لە بێ فەرمانیکردنی خودای تاك‌و تەنهاو بێ هاوەڵ بەدوور بگرن‌و ئاشتی‌و ئاسایشی بارودۆخ بپارێزن، ئەمجا وتی: لە خودا بپارێنەوە لە ئەمیر (ی کۆچکردوو)تان خۆش ببێت، چونکە ئەو حەزی لە لێبوردن‌و لێخۆشبوون دەکرد.[١] ئەمجا وتی: دوای ئەمە من چوومە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)و وتم: لەسەر پەیڕەوکردنی ئیسلام دەستی بەیعەتت پێ دەدەم، جا مەرجی: (النصح لكل مسلم) واتە: (دڵسۆزی نواندن بۆ هەموو موسڵمانێك)ی لەسەر پێویست کردم، منیش بەیعەتم لەسەر ئەمە پێدا، سوێند بە خودای ئەم مزگەوتە من دڵسۆزی ئێوەم، ئەمجا (أستغفر الله)ی وت‌و – لەسەر مینبەر– هاتە خوارەوە.[٢]

- ساڵی (٤٩)ی کۆچی (کوفە) کەوتە ژێر دەسەڵاتی (زیاد)، (فیل)ی خزمەتکاری (زیاد) بە ڕاشکاوی ئەمەی گوتووەو، دەڵێت: (زیاد) پێنج ساڵ حوکمڕانی (عێراق)ی کرد، ئەمجا لە ساڵی (٥٣)دا کۆچی دوایی کرد، ئەمە ڕاسترینی ئەو ڕیوایەتانەیە کە سەبارەت بەم بابەتە گێڕدراونەوە، بە جۆرێك کە (زیاد) لە ساڵی ٤٩ی کۆچیدا بووەتە (والی) عێراق‌و، لەم ماوەیەشدا هیچ ڕووبەڕووبوونەوەو تێکگیرانێك لە نێوان (حیجر)و (زیاد)ی والی (کوفە)دا ڕووی نەداوە، چونکە (حەسەنی کوڕی عەلی) (خودا لێیان ڕازی بێت) لە حاڵی حەیاتدا بووەو، بوون‌و مانی ئەویش لەو دەمەدا دەستەبەری سەرهەڵنەدانی هەر بەرهەڵستکاریەکی دەکرد کە پشتیوانەکانی ئەو پێی هەستن: (حەسەن) (خودا لێی ڕازی بێت) مەرجی لەسەر دانابوون: جەنگ لەگەڵ کێ بکات دەبێت جەنگی لەگەڵدا بکەن، ئاشتی لەگەڵ هەر کەسێك کرد، ئەوانیش ئاشتی لەگەڵدا دەکەن، بەڵام دوابەدوای کۆچی دوایی (حەسەن) (خودا لێی ڕازی بێت) لە ساڵی (٥١)ی کۆچی،[٣] هەڵوێستی هەندێك لە سەرکردەکانی (عێراق) لە

---

١ مرويات خلافة (معاوية) (ص: ٤٢٣).

٢ البخاري، صحيح البخاري مع الفتح (١/١٦٨).

٣ مرويات خلافة (معاوية) (ص: ٤٢٥).

بەرهەڵستی گوفتاریەوە بۆ بەرهەڵستی کرداری گۆڕا، کە لە نێویاندا (حیجری کوڕی عەدی) بەرچاو دەهات، (البلاذري) بە سەنەدی خۆی لە (الشعبي)و خەڵکانی تریشەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێن: کاتێك (زیاد) لەساڵی (٤٩)ی کۆچیدا هاتە (کوفە) لە دوا (حجر)ی ناردو پێی وت: هۆ فلانکەس: ئێمە ئاگامان لە تۆیە، ئێستا شتێکی تر هاتۆتە کۆڕو بارودۆخ گۆڕاوە، زمانی خۆت بگرەو لە ماڵی خۆت پاڵدەوە، ئەمە سەکۆی منەو ئەوەش جێ دانیشتنی تۆیە، وریا بە خەڵکانی پەستو نزم داتنەبەزێنن، یان کەسایەتیت نەپوشێنن، ئەگەر بڕیار بێت من حیسابت بۆ نەکەمو ڕێزت نەگرم، دەبێ بە چاوی کەم تەماشات بکەم، یەك قسەشت لەگەڵدا ناکەم، جا کە بەرەو ماڵ ڕۆیشتەوە، (شیعە) لە دەورەی کۆبوونەوەو گوتیان: تۆ گەورەو مامۆستاو چاوساغمانیو لە هەموو کەس لە پێشتری لە دژی ئەم حوکمە بوەستی،[1] جا کە (زیاد) بەرەو (بەصرە) بەڕێکەوت، (عەمروی کوڕی حدیث)ی لە پێشنوێژی کردنو سەرپەرشتی هێزی چەکداریدا کردە جێنشینی خۆی، (مهران)ی خزمەتکاری بەسەر (خەوارج)ەوە دانا، فەرمانی بە کارمەندانی کرد نامەگۆڕینەوەیان لەگەڵ عەمرو هەبێت، .... (عەمرو) بۆ زیادی نووسی: ئەگەر (کوفەت) گەرەکەو ناتەوێ لە ژێر دەستت دەربچێت، خێرا بگەڕێوە، ئێستا ئەو نامەت بۆ دەنووسم جگە لە کۆشکی ویلایەت هیچی تری ئەو شارەم لەبەر دەستدا نەماوە، هەمووی کەوتووەتە بەردەستی (حجر)و پشتیوانانی، ئیدی (زیاد) بەرەو کوفە گەڕایەوە، کە گەیشتەوە، بە دوای (عەدی کوڕی حاتەمی تائی)و (جریری کوڕی عبدالله ی بەجەلی) دا ناردو وتی:... بچن بۆ لای ئەو پیرە سەر بە گێچەڵە، من دەترسم بە هۆی ڕەفتارەکانیەوە کارێکمان پێ بکات کە کاری ئێمە نەبێت، ئەوانیش چوونە لای، .... قسەیان بۆ کرد، بەڵام ئەو ورتەی لێوە نەهاتو قسەی بۆ کەسیان نەکرد، کە هاتنەوە زیاد پێی وتن: چتان کرد؟ (عەدی) وتی: ئەی ئەمیر، ئەو پیاوێکی بە تەمەنە وازی لێ بێنە پەنای بدە، (زیاد) وتی: کەواتە لە (ئەبو سوفیان) نەبووم (ئەگەر لێی گەڕێم)، ئەمجا چەکداری ناردنە سەرو دەستیان بە جەنگوکوشتار کرد.[2] لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: کاتێك (زیاد) بە ئەمیرایەتی هاتە (کوفە)[3]، ڕێزی زۆری لە (حجری کوڕی ادبر)[4] گرتو لە خۆی نزیك کردەوەو

---

١ مرويات خلافة (معاوية) (ص: ٤٢٨)، أنساب الأشراف (٤/٢٤٦).

٢ أنساب الأشراف (٤/٢٤٦، ٢٤٧).

٣ لە ساڵی (٤٩)ی کۆچی بوو.

٤ (الأدبر) نازناوی (عەدی) باوکی بوو.

کردی بە خاترخواو تکاکاری خەڵك، کاتێك ویستی بەرەو (بەصرە) بچێت،[1] بانگی کردو پێی وت: (ئەی حیجر) بینیت چ ڕێزێکم لێنای، من بە نیازم بچمە (بەصرە)، حەز دەکەم لەگەڵمدا بی، دەترسم لە دوام بەجێ بمێنیو، هەواڵێکی وام سەبارەت بە تۆ پێ ڕابگەیەنرێتو، پاشان دڵم لە بەرانبەرتدا بگۆڕێت، ڕای تۆم سەبارەت بە (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) زانی، منیش پێشدا هەمان ڕاوبۆچوونم هەبوو، جا کاتێك بینیم خودا کاروباری بە لای معاویەدا لادا، ڕازی بوومو تۆمەتم نەدایە پاڵ قەزاوبڕیاری خودا ، بە چاوی خۆم بینیم ئیشو کارو حوکومەتی (عەلی)و هاوەڵانی بەرەو کوێ چووو چی لێهات، من ئاگادارت دەکەم لەوەی سواری ملی وڵاخە بەرزەیەك بی خەڵکانێکی تر لە پێش تۆدا سواری بووبن و هەڵیداشتبن.

مەبەست لە قسەی (زیاد) ئەوەیە: کە ئەو-بەرلەئێستا- یەکێك بووە لە کەسە نزیكو هەوادارەکانی (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت)، کاتێکیش بینی (حەسەن) تەنازولی بۆ (معاویە) کرد، ئوممەتیش بە یەکدەنگیو یەکڕەنگی بەیعەتیان پێدا، ئەویش چووە نێو بازنەی (جەماعەت)ەوەو پێداگیری لەسەر یەکڕیزی موسڵمانان کردو خۆی لە داوی فیتنەو ئاشوب پاراست، (حیجر) پێی وت: من نەخۆشمو ناتوانم لەگەڵت دەربچم، (زیاد) پێی وت: ڕاست دەکەی، وەڵڵاهی تۆ دینت نەخۆشە، دڵت نەخۆشە، ئەقڵت نەخۆشە، سوێند بە خوا: ئەگەر هەواڵێکی ناخۆشم لەسەر تۆ پێ بگات هەوڵ دەدەم بتکوژم، جا یان واز دێنی یان چاوەڕێی ئەمەبە ، (زیاد) لە (کوفە) دەرچوو و خۆی گەیاندە (بەصرە)، قاریئەکانی کوفە لە دەورەی (حیجر) کۆبوونەوە، هیچ فەرمانێکی کاربەڕێوەبەرەکەی (زیاد)یان جێبەجێ نەدەکرد، هەر شتێکی لێ داوا کردبان پێیان نەدەدا، ئەمجا بۆ (زیاد)ی نووسی: بە خودا من هیچ شتێکم لەگەڵ (حجر)و لایەنگرانی پێ ناکرێت، بۆ خۆشت چاکتر دەزانی، ئیدی (زیاد) سوارەکانی خۆی تاودانو بەرەو (کوفە) هاتەوەو گەمارۆیدا، (حیجر) خۆی ون کرد، لێی دەگەڕا بەڵام دەسەڵاتی پێ نەدەشکا.[2] لەنێو تەواوی ڕیوایەتەکاندا ڕیوایەتەکەی (أبو مخنف) تاك بۆتەوەو بە دوورو درێژی باسی تێکگیرانو ڕووبەڕووبوونەوەی نێوان شورتەکانی زیادو لایەنگرەکانی (حیجر)ی کردووە،[3] هەروەها بە تەنێ شایەتیدانی دانیشتوانی (کوفە)ی بۆ (حیجر)و هاوەڵانی بە بایەخەوە خستۆتەڕوو.[4]

---

١ لە ساڵی (٥١)ی کۆچیدا بوو.

٢ أنساب الأشراف (٤/٢٧٠، ٢٧١).

٣ تأريخ الطبري (٦/١٧٧، ١٨٣).

٤ تأريخ الطبري (٦/١٨٤، ١٨٦).

**١ـ بڕیاری (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) دەربارەی (حیجر) (خودا لێی ڕازی بێت)و هاوەڵانی:**

مەسەلەی (حیجری کوڕی عەدی) یەجگار مەترسیدارو هەستیار بوو، لەبەر ئەمە لە کاتی خۆبەدەستەوەدانیدا، (زیادی بابرای معاویە) بە مەرجی حیجر ڕازی بوو کە بە خۆیو هاوەڵانیو کێشەکەیانەوە حەواڵەی (معاویە)یان دەکات،[١] پێش ئەوە قسە لەسەر حوکمدانی (حیجر)و هاوەڵانی بکەین لە لایەن (معاویە)وە، پێویستە ئەو تۆمەتانە باس بکەین کە ڕووبەڕوویان کرابوونەوە، تۆمەتەکان بە گوێرەی ڕیوایەتەکەی (أبی مخنف) ئەمانەن بوون:... حیجر گەلەکۆمەوشۆڕشی لە دژی (معاویە)ی خەلیفە و ئەمیری ئیمانداران کردووەو، بە ئاشکرا قسەی دەرهەق کردون و جاڕی جەنگی لە دژی داوەو، ڕایگەیاندووە کە پۆستی (خیلافەت) جگە لە بنەماڵەی (ئەبو تالیب) بۆ هیچ کەسو بنەماڵەیەکی تر ناشێتو ناگونجێت و، دەستی بەسەر شاری کوفەدا گرتووەو کاربەڕێوەبەری ئەمیری ئیماندارانی لەوێ دەرکردووەو، پاساوی بۆ (سازشەکانی) ئەبو توراب[٢] هێناوەتەوەو، ڕەحمەتی خودای بۆ ئەو ناردووەو، بەری بوونی خۆی لە بەرانبەر دوژمنەکەیو ئەوانەی شەڕیان لە دژ کردووە ڕاگەیاندووەو، ئەو کۆمەڵە خەڵکەی ئێستا لەگەڵی ڕەپێچەکدراونو هێنراون سەردەستەی لایەنگرەکانی ئەوونو هەمان ڕاوبۆچوونی ئەویان هەیە.[٣]

بەڵام سەبارەت بە حوکمدانی (حیجر) (خودا لێی ڕازی بێت)و هاوەڵەکانی لە لایەن (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت)، بەو شێوەیە نیە کە وەك هەندێك ڕیوایەت باسی دەکەن، (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) دەستبەجێ نەیکوشتوون، داواشی لێ نەکردوون بەری بوونی خۆیان لە بەرانبەر (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) دەرببڕن،[٤] بەڵکو هەم (ئیستیخارە)ی کردووەو داوای لە خودا کردووە لەم هەڵوێستەیدا ڕێی خێری نیشان بدات، هەم (ئیستیشارە)ی کردووەو ڕای ڕاوێژکارانی خۆیشی دەربارە وەرگرتوون، ئەمجا بڕیاری لەسەر ئەوە ساغ بۆتەوە هەندێکیان بکوژێتو ئەوانی تریشیان ئازاد بکات، بەڵگەمان لەسەر ئەمە ئەو ڕیوایەتەیە کە (صالحی کوڕی أحمدی کوڕی محمدی کوڕی حەنبەل)[٥] بە سەنەدێکی

---

١ تأريخ الطبري (٦/١٨٧، ١٨٨).

٢ (أبو تراب) نازناوی (عەلی کوڕی ئەبو تالیب)ە.

٣ تأريخ الطبري (٦/١٨٨).

٤ مرويات خلافة (معاوية) (ص: ٤٣).

٥ (الذهبي) دەڵێت: ڕاستبێژو بڕواپێکراوە (١٢/٥٢٩).

(حەسەن) هێناویەتیو ،وتی: باوکم[1] قسەی بۆ کردمو وتی: (أبو المغیرة)[2] قسەی بۆ کردین، وتی: (إبن عیاش)[3] قسەی بۆ کردینو ، وتی: (شرحبیل کوڕی مسلم)[4] قسەی بۆ کردمو ، وتی: لەو کاتەدا (حیجری کوڕی عەدی کوڕی ئەدبور)و هاوەڵەکانی لە (عێراق)ەوە بەرەو لای (معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان) بەڕێکران، (معاویە) بەر لەوە بیانکوژێت ڕای خەڵکی لەسەر وەرگرتن، هەبوو ڕای خۆی لەسەر دەردەبڕینو هەبوو بێ دەنگ دەبوو و هیچی نەدەوت، جا (معاویە) بەرەوماڵی خۆی چۆوە، دوای ئەوەی نوێژی نیوەڕۆی کرد، هەستاو وتارێکی بۆ خەڵك خوێندەوە، سوپاسو ستایشی خودای کردو ئەمجا لەسەر مینبەرەکەی دانیشت، بانگکەر هەستاو ڕاوەستا، بانگی کرد: (عەمروی کوڕی ئەسوەدی عەنسی)[5] لە کوێیە؟ (عەمرو) هەستاو سوپاسو ستایشی خودای کردو، ئەمجا وتی: هۆشیار بن کە ئێمە هەمووما لە قەڵایەکی مەحکەمی خودا داینو فەرمانمان پێ نەکراوە پشتی لێکەینەوەو وازی لێ بێنین، سەبارەت بە قەولو قەراری دەرهەق بە خەڵکی (عێراق) ئەی ئەمیری ئیماندارا، دەڵێم: تۆ سەرکردەیو ئێمەش ژێردەستەین، خۆت لە دەردو دەرمانیان شارەزاتری لە ئێمە، ئێمە لەسەرمانە بڵێین: ﴿سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ﴾[6] واتە: بیستمانو بە قسەمان کردی، ئەی پەروەردگارمان: داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەین، سەرەنجاممان بۆ لای تۆیە. (معاویە) وتی: بەڵام (عەمروی کوڕی ئەسوەد) بەریبوونی خۆی لە ڕژانی خوێنیان دەربڕیو ئەم بەرپرسیاریەتیەی هەڵدایە بەر دوو چاوی معاویە.

ئەمجا بانگکەر بانگی کرد: (ئەبو موسلیمی خەولانی) لە کوێیە؟ (أبو موسلیم) هەستاو سوپاسو ستایشی خودای کردو ئەمجا وتی: بە خودا لەو کاتەوە خۆشمان ویستوی، ڕقمان لێ نەبویتەوە، لەو کاتەوە فەرمانبەرداریمان بۆ کردووی سەرپێچی تۆمان نەکردووە، لەو کاتەوە پەیمانمان پێداوی بەڵێنشکێنیمان نەکردووی، ئەگەر فەرمانمان پێ بکەی پێویستە لەسەرمان گوێڕایەڵیو فەرمانبەرداریت بکەین، هەر کاتێك بانگمان بکەی وەڵامت

١ ئەحمەدی کوڕی محمدی کوڕی حەنبەل: بڕواپێکراوو دەرخکەرو شەرعزانو بەڵگەیە.
٢ عبدالقدوس کوڕی حەجاجی خەولانی، ئەمیری (موغیرە).
٣ إسماعیل کوڕی عەیاشی عەنسی، حمیصی ڕاستبێژە.
٤ (شرحبیل کوڕی موسلیمی خەولانی)یە، شامیە، یەکێك بوو لە پیاوماقوڵانی شام.
٥ (مخضرم)ەو هەردووك سەردەمی نەفامیو ئیسلامی بینیون، یەکێکە لە تابیعیە گەورەکان، لە سەردەمی معاویەدا مردووە.
٦ البقرة (٢٨٥).

دەدەینەوە، ئەگەر پێشماندایەوە ئاوڕت بۆ دەدەینەوە. ئەمجا دانیشت، بانگكەر بانگی ڕاهێشت‌و وتی: (عبدالله ی كوڕی میخمەری شەرعبی)[١] لە كوێیە؟ هەستاو سوپاس‌و ستایشی خودای كردو وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران! سەبارەت بە ئەم تاقمەی (عێراق) دەڵێم: ئەگەر سزایان بدەی پێكاوتە، ئەگەر لێیان ببوری چاكە دەكەی.

بانگكەر بانگی ڕاهێشت‌و وتی: (عبدالله ی كوڕی ئەسەدی قەسری) لە كوێیە؟ هەستاو سوپاس‌و ستایشی خودای كردو وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران: ڕەعیەت‌و ژێردەستەو خەڵكی خۆتن، ئەگەر سزایان بدەی ئەوا بەرهەمی گوناهی خۆیانە، ئەگەر لێشیان ببوری ئەوە لێبوردن لە تەقواوە نزیكترە، ئەی ئەمیری ئیمانداران: بە قسەی كەسانێكمان مەكە كە نەفام‌و ستەمكارەو بە درێژایی شەو خەوتووەو لە بەرانبەر ئەنجامدانی كاری دواڕۆژ پەست‌و بێزارە...[٢] ئەی ئەمیری ئیمانداران! ئەم دونیایە گوڵمێخەكانی گوروانن، پایەكانی لاربوونەوە، خەڵكەكەی هەر خۆشی دەوێ، كاتی ڕووخانی نزیكە، ئەمجا دانیشت.

جا بە (شرحبیل)م وت:[٣] جا چۆن ڕەفتاری كرد؟ وتی: هەندێكی كوشت‌و هەندێكیشی هێشتنەوە، (حیجری كوڕی عەدی كوڕی ئەدبور) لە ڕیزی كوژراوەكاندا بوو،[٤] (حیجر) بەر لە كوژرانی وتی: ئەی كەس‌و كارەكەم جارێك لێم گەڕێن با دوو ڕكات نوێژ بخوێنم، جا لێی گەڕان، دەستنوێژی هەڵگرت‌و دوو ڕكات نوێژی كرد، زۆری نەخایاند پێی وترا: زۆرت پێچوو، مەسەلە چە؟ تەنگەتاو بووی؟ وتی: هیچ نوێژێكم لەم نوێژە كورتترو سوكتر نەكردووە، ئەگەر بە هەڵپە كەوتبامایە، خۆ بە چاوی خۆم: چاوم لە شمشێری لە كێلان دەركێشراوو كفنی كراوەو گۆڕی هەڵكەنراوە، ئەمەو هۆزەكانی خۆیان كفنیان بۆ هێنابوون‌و گۆڕیشیان بۆ هەڵكەندبون..... وتراوە كە وتوویەتی: بەڵكو (معاویە) كە ئەم كارەی كردووە (بە هەڵپە كەوتووە).

(حیجر) وتی: خودایە ئێمە ئەتۆ بە گژ ئۆممەتەكەماندا دەكەین، خەڵكی (عێراق) شایەدی –ئەو ئۆمەتانەیان– لەسەر داین، خەڵكی (شام)یش كوشتیانین. پێی وترا: گەردنت درێژ بكە، جا وتی: ئەمە ڕشتنی خوێنە، لە دژی خوێنی خۆم هاریكاریتان ناكەم،[٥] لە ڕیوایەتێكی

---

١ شامیەو، (مخضرم)ەو لە دوو سەردەمی ئیسلامی‌و نەفامیدا ژیاوە، لە (أبو درداء)ەوە ڕیوایەتی كردووە.

٢ مرویات خلافة (معاویة) (ص: ٤٣٤)، نقلا عن تأریخ دمشق (٤/٢٧١).

٣ قسەكەر (إسماعیل كوڕی عیاش)ە.

٤ أحمد بن حنبل: المسائل روایة إبنه الصالح (٢/٣٢٨ـ٣٣١).

٥ سیر أعلام النبلاء (٣/٤٦٥).

تردا هاتووە: کاتێك (حیجر)یان بۆ لای (معاویە) هێنا، وتی: سلامٌ علیك ئەی ئەمیری ئیمانداران، وتی: ئایا من ئەمیری ئیماندارانم؟ دەی لە گەردنی بدەن، جا دوو ڕکات نوێژی کردن‌و بە کەسوکارەکەی خۆی وت: کۆت‌و زنجیرم لێ مەکەنەوە، خوێنەکەشم لێ مەشۆنەوە، من‌و (معاویە) لە ڕێگا بە یەکتر دەگەینەوە.[١]

(إبن العربی) لە پەراوێزی باسی کوشتنی (حیجری کوڕی عەدی) (خودا لێی ڕازی بێت)دا دەڵێت: ویستی خەڵك بۆ ئاشوب ڕاست بکاتەوە، (معاویە) حیسابی ئەو کەسانەی بۆ کرد کە خراپە لەسەر زەوی بەرپا دەکەن.[٢] هەروەها لە بڕیاری کوشتنیاندا پشتی بەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) بەست کە دەفەرموێت: ((مَنْ آتاکم، وأمرُکم جمیعٌ علی رجُلٍ واحدٍ، یُریدُ أن یَشُقَّ عصاکم، أو یُفَرِّقَ جماعتکم فاقتلوه))[٣] واتە: ئەگەر لە حاڵێکدا بڕیارتان لەسەر پیاوێك یەکی گرت‌و یەکێکیش هات ویستی کەلێن بخاتە نێو ڕیزتانەوە، یان جەماعەتەکەتان لێ پەرتەوازە بکات، ئەوا بیکوژن. هەروەها ئەم فەرموودەیەش: ((إنَّهُ ستکون هناتٌ و هناتٌ، فمن أراد أن یفرِّقَ أمرَ هذه الأُمةِ وهي جمیعٌ، فاضربوه بالسیف کائناً من کان))[٤] واتە: لەمەولا ئاشوب لەسەر ئاشوب دێت، هەر کەسێك ویستی کاروباری ئەم ئۆممەتە ئەگەر کۆك بوو پەرتەوازە بکات، هەر کەسێك بوو بە شمشێر لە گەردنی بدەن. پێویستە لەم شوێنەدا ئەوە بە یاد خۆمان بخەینەوە: ئەگەر (حیجری کوڕی عەدی) (خودا لێی ڕازی بێت) لەم دژایەتیکردنەیدا لە گوفتار تێی نەپەڕاندبایەو بە کردار ڕانەپەڕیبایە، ئەوا لە لایەن (معاویە)وە (خودا لێی ڕازی بێت) ئەم بڕیارەی بۆ دەرنەدەکراو نەدەکوژرا، هەواڵی (میسوەری کوڕی میخرەمە)و چەندین هەواڵی تر کە لە پێشدا باسمان کردن دەبنە بەڵگە بۆ ڕاست‌و دروستی ئەم قسەمان.[٥]

**٢ـ هەڵوێستی (عائیشە) (خودا لێی ڕازی بێت) لە مەڕ کوژرانی (حیجری کوڕی عەدی) (خودا لێی ڕازی بێت):**

ڕیوایەتەکان سەبارەت بە هەڵوێستی (عائیشە) (خودا لێی ڕازی بێت) لە بەرانبەر کوژرانی (حیجری کوڕی عەدی)دا زۆریان زێدەڕۆیی کردووە، بە گوێرەی هەندێکیان کاتێك لە ساڵی

---

١ المصدر نفسه (٣/٤٦٦).

٢ العواصم من القواصم (ص: ٢٢٠).

٣ مسلم، صحیح مسلم بشرح النووي (١٢/ ٢٤٢).

٤ المصدر نفصه (١٢/٢٤١).

٥ مرویات خلافة (معاویة) في تأریخ الطبري (ص: ٤٣٥).

(٥١)ی کۆچیدا (معاویە) لە (مەدینە) سەردانی کرد، (عائیشە) هەڕەشەی جەنگو تۆڵەی لەگەڵ کردنی لێکردووە،[1] ئەم ڕیوایەتانەی سەبارەت بەمە دەرهەق بە (عائیشە)ی دایکی ئیمانداران (خودا لێی ڕازی بێت) خراونەتەڕوو فریان بەسەر ڕاستیەوە نیە، بەڵکو چۆنیەتی هەڵوێستی ئەو بەم شێوەیە بووە:

لە (ئەبی مەلیکە)وە: (معاویە) هاتو داوای لە (عائیشە) کرد مۆڵەتی بدات سەردانی بکات، ئەویش مۆڵەتی پێ نەدا، (ذەکوان)[2]ی خزمەتکاری هاتەدەر، (معاویە) پێی وت: وای بۆ تۆ: کە مۆڵەتم بۆ لە (عائیشە) وەرنەگری، عائیشە لێم تووڕە بووە، بەردەوام (ذەکوان)ی ڕاسپارد، تا دەرەنجام ڕێگەی پێدا ،(ئەبی مەلیکە) دەڵێت: (ذەکوان) لە گوێڕایەڵیکردنی بۆ عائیشە لە من چاکتر بوو، کاتێك (معاویە) چووە لای، وتی: هۆ دایەگیان ڕەحمەتی خوات لێ بێت چت پێوەدیتوم؟ وتی:.... ئەوەم پێوە دیتوی: (حیجر)و هاوڕێکانی ئەوت کوشتن، پێی وت: ..... بەڵام دەربارەی (حیجر)و هاوڕێکانی، من لە شتێکیان لێ دەترسام، ترسام بە هۆیانەوە ئاشوبێك بەرپا ببێت، بە ناهەق خوێنی تێدا بڕژێتو حەرامەکانی تێدا حەڵاڵ بکرێنو ، تۆش دەمترسێنی، لێم گەڕێ، خودا خواستی لەسەر چ بێ دەیکات، وتی: بە خودا وازم لێ هێناوی، بە خودا کۆڵم لێدای، بە خودا لێت گەڕام.[3]

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: کاتێك (معاویە) هاتە (مەدینە)، سەردانی (عائیشە)ی کرد، (عائیشە) پێی وت: ئەوە بۆ (حیجر)ت کوشت؟ وتی: ئەی دایکی ئیمانداران، من پێم وابوو بە هۆی کوشتنی کەسێك نێوانی خەڵك چاك بێت، زۆر لەوە باشترە بژیاو بە هۆیەوە نێوانی خەڵك تێك بچێت.[4]

٣ـ پەشێمان بوونەوەی (معاویە) لەسەر کوشتنی (حیجری کوڕی عەدی):

لە ڕیوایەتێکدا هاتووە:..... (عائیشە) (خودا لێی ڕازی بێت) سەبارەت بە (حیجر)و هاوڕێکانی، (عبدالرحمن ی کوڕی حارثی کوڕی هوشامی) بۆ لای (معاویە) بەڕێکرد، کاتێك گەیشتەجێ کوشتبوونی، (عبدالرحمن) پێی وت: ئەو دەمە ئەقڵی (ئەبی سوفیان)ت لە کوێ لێ بزر ببوو؟ وتی: ئەو کاتە لێم بزر بوو کە ئاقڵمەندانی وەکو تۆی نێو هۆزی خۆم لێ بزر ببوون،[5] (الذهبي) دەڵێت: واتە ئەو پەشێمان بۆتەوە،[6] لەگەڵ ئەوەدا کوژرانی (حیجر)

---

١ المصدر نفسه (ص: ٤٣٨).

٢ (ذەکوان): أبو عمرو، خزمەتکاری عائیشە، بڕواپێکراو، ساڵی (٦٣)ی کۆچی لە (مەدینە) کۆچی دوایی کردووە.

٣ تأريخ دمشق (٤/٢٧٣، ٢٧٤)، نقلا عن مرويات (معاوية) (ص: ٤٤٠).

٤ تأريخ دمشق (٤/٢٧٣)، نقلا عن مرويات (معاوية) (ص: ٤٤٠).

٥ تأريخ الطبري (٦/١٩٥).

٦ سير أعلام النبلاء (٣/٤٦٥).

(خودا لێی ڕازی بێت) لە لایەن (معاویە)وە پاساوی زۆری بۆ دەهێنرێتەوە، بەڵام لە ڕاستیدا: غەڵەتێك بوو لە دەست (معاویە) قەومابوو، دەبوایە لە بەرانبەر هاوەڵێکی ئاوا گەورەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) مێشكو دڵی خۆی فراوان کردبایەو نەرمونیانی نواندبایە، لە ڕاستیدا (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) بە چاکی لە کوشتنی (حیجر) پەژێوان بۆوە، بە درێژایی تەمەنی خۆی ئەم کارەساتەی باس دەکردو لە بیری نەدەچۆوە.[١] گێڕدراوەتەوە کە لە سەرەمەرگیدا وتبووی: ڕۆژێکی دوورو درێژم لەگەڵ (إبن الادبر) واتە (حیجر) هەیە، ٣ جار ئەمەی وت.[٢]

٤ـ هەڵوێستێکی (مالك کوڕی هەبیرەی سکونی) (خودا لێی ڕازی بێت):

(مالکی کوڕی هەبیرەی سکونی) تکای لە (معاویە) کرد، لە (حیجر)و هاوەڵانی ببوورێت، بەڵام تکاکەی نەگرتەوە، (مالیك) بە خاتری ڕزگارکردنی (حیجر)و هاوەڵەکانی پیاوانی هۆزەکەی خۆی کۆکردنەوەو بەرەو شوێنی گیرسانەوەیان ڕۆیشتن، لە ڕێگادا تووشی بکوژەکانیان بوون، پرسیاریان لێکردن کە لە کوێن؟ وتیان: مردن، بەرەوە لای (عەدی) ڕۆیشت، لە کوژرانیان دڵنیا بوو، بە دوای بکوژەکانیدا نارد، بەڵام پێیان نەگەیشت، هەواڵی ئەمەیان بە (معاویە) دا، وتی: ئەمە گڕو تینو بڵێسەی هەناویەتی، من هەوڵ دەدەم بیکوژێنمەوە، ئەمجا سەد هەزاری بۆ ناردو وتی: ترسام ئەو خەڵکە جەنگێك بەرپا بکەن، زیانێکی زیاتری بۆ موسڵمانان لێ بکەوێتەوە کە لە زیانی کوشتنی (حیجر) زیاتر بێ بەمە دەروونی دامرکایەوە،[٣] (مالکی کوڕی هەبیرەی سکونی) (خودا لێی ڕازی بێت) یەکێك بوو لە هاوەڵە بەرزو بەڕێزەکان، (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) کردی بە والی (حمص)و سەبارەت بە ئەو دەیوت: ئامۆژگاری هیچ عەرەبێك بە قەد ئامۆژگاری (مالکی کوڕی هەبیرە) سەبارەت بە جەماعەتی موسڵمانان لەسەر دڵو دەروونی من کاریگەر نەبووە.[٤]

(معاویە) جگە لە سزای (کوشتن)، سزای (بەندکردن)و (لێکجیاکردنەوە)شی بەکاردەهێنا، بینیمان چۆن (حیجر)ی کوشتو ئەو ئەندامانەی تاقمەکەی مانەوە چۆن لێکی جیاکردنەوە، منەتکردن بەسەر کەسو کارەکانیاندا یەکێکی تر بوو لە سیاسەتەکانی ئەو.[٥]

---

١ العالم الإسلامي في العصر الأموي (ص: ١١٦).

٢ تأريخ الطبري (٦/١٩٦).

٣ تأريخ إبن خلدون (٣/١٧).

٤ أثر الحياة السياسية في الدولة الأموية (ص: ٦٧١)، الطبقات الكبرى (٧/٤٢٠).

٥ القراء ودورهم في الحياة العامة (ص: ١٩٥).

**٥ـ پێداهەڵگوتنی (حیجری کوڕی عەدی):**

(هیند)ی کیژی (مخرمە)ی ئەنصاری ناوای بە (حیجر)دا هەڵگوتووە:

| | |
|---|---|
| ترفـع أيهــا القمــر المنــير | تبصر هل ترى حجراً يسيراً |
| يسير الى (معاوية) بن حرب | يقتـله كــم زعـم الأمــــير |
| تجـبرت الجبــابر بعد حجر | وطاب لها الخورنـق والسدير |
| وأصبحت البـلاد بها محولاً | كأن لـم يحيهــا مــزن مطير |
| ألا يــا حـجر بــن عــدي | تلقاك الســلامة والســرور |
| أخاف عليك مـا أدري عدياً | وشيخاً في دمشـق لـه زئير |

تا ئەوەی دەڵێت:

| | |
|---|---|
| ألا يا ليت حجر مات موتاً | ولم ينحر كما نحر البعير |
| فإن تهلك فكل زعيم قوم | من الدنيا إلى هلك يصير[١] |

ئیتر جگە لە مەسەلەی (حیجر)و هاوڕێکانی، (معاویە) بەرانبەر بە ڕەعیەتەکەی پابەندی ئەو سیاسەتە ئاشتیخوازیە بوو کە لەسەر پایەی نەرمونیانی‌و سینگ غراوانی وەستابوو، بە خودی خۆی ئەم سیاسیەتەی لە چەند ڕستەیەکدا پوخت کردونەتەوە، کاتێك دەڵێت: ئەگەر قەمچی دەستم بەشم بکات شمشێرەکەم ناوەشێنم، ئەگەر زمانەکەم دادم بدا قەمچیەکە ڕاناوەشێنم، ئەگەر مویەکی باریك لە نێوان منو خەڵکدا هەبووبێت هەرگیز نەپساوە، کاتێك لە لای خۆیانەوە، ڕایانکێشابێت دەستم لێ شل کردووەو لە دومداون، کاتێك شلیان کردبێت ڕامکێشاوە گشتم کردۆتەوە.[٢] ئەمە بریتیە لە سیاسەتێکی حەکیمانەی وا ڕێی بەردەم هەموو جۆرە گوفتارو ڕەفتارێك والاّ دەکات مادام لە سنووری خۆیان تێناپەڕێنن، بە جۆرێك ئەگەر سەروەت‌و سامان بەش بکات پشت بە (زمان) نابەستێ، ئەگەر بەشی بکات قەمچیەکەی بەکارناهێنێت‌و ئەگەر قەمچیەکەی بەشی بکات شمشێرەکەی ناوەشێنێت،[٣] گوتراوە کە: (سەلیم)ی خزمەتکاری (زیاد) لە لای (معاویە) دەبێ، شانازی بە (زیاد)ەوە دەکات، (معاویە) وتی: وسبە، هاوڕێکەت بە شمشێر هیچی بە دەست نەهێناوە ئەوەی بە زۆری دەستم کەوتووە لە ڕێی زمانمەوە بووە.[٤]

---

١ تأريخ الطبري (٦/١٩٦).

٢ السلطان لإبن قتيبة (ص: ٥١).

٣ السلطة والمعارضة في الاسلام، زهير هوّاري (ص: ٦٢).

٤ السلطان لإبن قتيبة (ص: ٥٢).

## باسی دووەم: معاویەو بەڕێوەبەرایەتیکردنی کاروباری دەوڵەتەکەی بە شێوەی ڕاستەوخۆو داکۆکی کردن لەسەر سەقامگیرکردنی ئاسایش لە خیلافەتەکەیدا:

## یەکەم: بەڕێوەبردنی کاروبار بە خودی خۆی:

بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەتەکەی بە خودی خۆی، یەکێك بوو لەو بنەمایانەی سیاسەتی نێوخۆی معاویەی لەسەر ڕاوەستابوو، ئەو لەگەڵ ئەوەدا پشتی بە لێهاتووترینو شارەزاترین کەسانی سەردەمی خۆی بەستبوو، بەڵام سووربوو لەسەر زانینی وردو درشتی نێو دەوڵەتەکەیو هەموو کاتی ژیانیو تەقالاکانی بۆ دەوڵەتداریەکەیو چاودێریکردنی بەرژەوەندی موسڵمانان تەرخانکردبوو.[1]

١ـ کۆڕی ڕۆژانەی معاویە:

معاویە (خودا لێی ڕازی بێت) لە شەوو ڕۆژێکدا پێنج جار دەردەکەوت، کە لە نوێژی بەیانی دەبۆوە، دادەنیشت تا حیکایەتخوان حیکایەتەکەی تەواو دەکرد، ئەمجا دەچووەوە گۆشەیەکەوەو (موصحەف)ەکەی دەهێناو جوزئێکی دەخوێند، ئەمجا دەگەڕایەوە ماڵو بە هاوسەرو ڕۆڵەکانی دەوت: ئەمە بکەنو ئەوە مەکەنو ئەمە ڕێتان بێ ئەوە شوێنتان بێت، دوایە چوار ڕکات نوێژ–ی چێشتەنگاو–ی دەکردن، ئەوجا بەرەو (مەجلیس)ی ڕۆژانەی دەچوو، بانگهێشتی کەسە تایبەتەکانی خۆی دەکرد، گفتوگۆی لەگەڵ دەکردن جا وەزیرەکانی دەهاتنو سەبارەت بە بەرنامەی کاری ئەو ڕۆژەیان قسەیان لەگەڵ دەکرد، ئەمجا چێشتەقوڵەیان بۆ دێنا کە بریتی بوو لە بەرماوەی خواردنی ئێوارەی،.... ئەمجا بە دوورو درێژی قسەی دەکردن، دوایی ئەگەر ویستبای سەرێکی لە ماڵو خێزانی دەدایەوەو خێرا دەگەڕایەوەو دەیوت: ها کوڕێژگە کورسیەکە بێنە، کورسیەکەی بۆ دێناو پاڵی بە لادیواری کۆشکەوە دەدا، پاسەوانەکانیش بە پاوە دەوەستان، ئیدی خەڵکی داماو و دەشتەکیو خێڵەکیو ژنو منداڵ دەهاتنە لای، یەکێك دەهاتو دەیگوت: ستەمم لێکراوە، (معاویە) دەیگوت: دەی هەقی بسێننو سەری بخەن. یەکێکی تر دەیگوت: دەستدرێژیم کراوەتە سەر، (معاویە) دەیگوت: کەسانێکی ئازای لەگەڵ بنێرن، یەکێکی تر دەیگوت: ئەو کارەیان بەسەر هێناوم، (معاویە) دەیگوت: لێکۆڵینەوەی بۆ بکەن، تا ئەوەی کەس نەدەما،

---

١ العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ١١٧).

ئەمجا دەچووە ژوورەوەو لەسەر دۆشەکەکەی دادەنیشت‌و دەیگوت: بە پێی پلەوپایەی خۆیان ڕێ بە خەڵك بدەن بێنە لام‌و لە وەڵامدانەوەی سەلام سەرقاڵم مەکەن، ئەمجا پیاوماقوڵان دەهاتن، پێی دەگوترا: ئەمیری ئیمانداران (خودا دەست بە تەمەنتەوە بگرێت) ئێمڕۆ چۆنە؟ دەیگوت: لە سایەی خوداوە باشم، جا کە ڕیزی دانیشتنەکەیان ڕێك دەکەوت، دەیگوت: هۆ خەڵکینە ناوتان لێنراوە (پیاوماقوڵ‌و ڕێزدار)، چونکە لەنێو خەڵکدا هەڵبژێردراون‌و ڕێتان پێدراوە بێنە ئەم مەجلیسەوە، پێداویستی‌و ناگوزوری ئەو کەسانەم بۆ بخەنەڕوو دەستیان بە ئێمە ڕاناگات، یەکێك هەڵدەستاو دەیگوت: فڵان کەس شەهید بووە، (معاویە) دەیگوت: بەش بۆ ڕۆڵەکانی دانێن، یەکێکی تر دەیگوت: فڵانە کەس بێ سەرو شوێن بووە، (معاویە) دەیگوت: یارمەتی خێزانەکەی بدەن‌و ماڵیان بدەنێ‌و پێداویستیەکانیان بۆ جێبەجێ بکەن‌و خزمەتیان بکەن، خواردن دەهات‌و (کاتب)یش لە پشت سەریەوە دەوەستا، یەکێك دەهات‌و پێویستیەکەی خۆی دەخستەڕوو، پێی دەگوترا: لەسەر سفرە دانیشە، دادەنیشت‌و دەستی درێژ دەکردو دوو سێ پاروی دەخواردن‌و (کاتیب)یش کاغەزەکەی دەخوێندەوەو ئەویش فەرمانی دەدا ئەم شتانەی بۆ بنووسن، جا دەگوترا: ئەی بەندەی خودا بڕۆ با یەکێکی تر بێ، ئیتر لە ماوەی ئەو نانخواردنەدا هەموو هەژارو نەدارو خاوەن پێویستیەکانی ئەو ڕۆژە کە خۆیان لە چل کەسێك دەدا دەهاتن‌و پێویستیەکانی بۆ جێبەجێ دەکردن، ئەمجا خواردنەکە هەڵدەگیرایەوەو خەڵکەکەش لێی بڵاو دەبوون، معاویەش بەرەو ماڵی خۆی دەچۆوەو کەس خۆی تێ نەدەگەیاند، کە بانگی نیوەڕۆ دەدرا، دەهاتە مزگەوت‌و نوێژی دەکرد،[1] ئەمجا بەرەو مەجلیسەکەی دەچووو لێی دادەنیشت‌و ڕێگای کەسە تایبەتەکانی دەدا بێنە لای، ئەگەر وەرزی زستان بوایە میوەی خۆشکراوی وەکو هەنجیرو مێوژو باسوخ‌و حەڵوای بە شەکرو کێکی نەرمیان بۆ دەهات، ئەگەر وەرز هاوین بوایە میوەی تەڕو تازەیان بۆ دەهات، وەزیرەکانی دەهاتن‌و سەبارەت بە کرداری تاقی ئێوارەیان پرس‌و ڕایان لێ وەردەگرت، ئیتر تا کاتی بانگی (عەصر) دادەنیشت، ئەمجا مەجلیسی بەجێ دەهێشت‌و دەچووە مزگەوت‌و نوێژی عەصری دەکرد، دوایی سەری لە ماڵ‌و خێزانی دەدایەوە، تا دوا ساتەکانی دەمەو ئێوارە کەس تەمای پێ نەبوو نەیدەدی، ئەمجا بەرەو (مەجلیس)ەکەی دەهاتەوەو، لەسەر دۆشەکەکەی دادەنیشت،

---

١ الشهب اللامعة في السياسة النافعة (ص: ٣٠٩).

ئەمجا بە گوێرەی پلەو پایەیان ڕێگەی بە خەڵك دەدا بێنە لای، جا خواردنی ئێوارەیان دێنا، تا بانگی (شێوان) دەدرا لە خواردن دەبۆوە، کە بانگ دەدرا دەچووە مزگەوت‌و نوێژی (شێوان)ی دەکرد، ئەمجا چوار ڕکات سوننەتی دەکردن‌و لە هەر ڕکاتێکدا پەنجا ئایەتی دەخوێند، جار هەبوو دەنگی هەڵدێناو، جار هەبوو دەنگی کز دەکرد، کە لێ دەبۆوە بەرەو ماڵ دەچۆوە، هەتا بانگی (خەوتنان)ی دەدا کەس هەقی بەسەرەوە نەبوو، دەهاتە دەرو نوێژی (خەوتنان)ی دەکردو بەرەو (مەجلیس) دەچۆوە، ئەمجا ڕێی بە کەسە تایبەت‌و نزیکەکانی‌و وەزیرو دەست‌و پێوەندەکانی دەدا بێنە لای‌و لەگەڵیان کۆدەبۆوە، وەزیرەکانی سەبارەت بە ئیشەکانی شەویان گفتوگۆیان لەگەڵ دەکردو فەرمانیان لێ وەردەگرت، سێیەکی یەکەمی ئەو شەوەی بە باس‌و خواس‌و بەسەرهاتی عەرەب‌و عەجەم‌و مەلیك‌و سیاسەتەکانیان لە بەرانبەر ڕەعیەتەکانیان‌و جەنگ‌و هەرای نەتەوەکان‌و فرۆفێڵەکانیان دەبردەسەر، ئەمجا لە لای هاوسەرەکانیانەوە چەند جۆر شەوچەرەی نایابی حەڵواو شتی تریان بۆ دەهات، ئەمجا دەهاتەوە ماڵ‌و سێیەکی دووەمی شەو دەخەوت، دوایە ڕادەبووو ئەو دەفتەرو نوسراوانەی دەهێنان کە بەسەرهاتی مەلیك‌و حوکومەتەکانیان‌و جەنگ‌و هەراو فرۆفێڵی جەنگیان تێدا نوسرابوونەوە، هەندێك خزمەتکاری هەبوون لەسەر دەرخکردن‌و باشخوێندوەی ئەو دەفتەرانەی ڕاهێنابوون‌و پێی دەخوێندنەوە، هەر شەوێك ڕادەبوری گوێی لە چەند ڕستە هەواڵێکی پێشینان دەبووو ئاشنای ڕێ‌و ڕەوشتەکانیان دەبوو، ئەمجا کە بانگی نوێژی بەیانی دەدا، دەچووە مزگەوت‌و نوێژی بەیانی دەکرد، ئەمجا وەکو وەسفمان کرد بەرنامەی کارو کرداری ڕۆژانەو شەوانەی خۆی دەست پێ دەکردەوە، (عبدالملك کوڕی مەروان)و چەند خەلیفەیەکی تری ئومەویش ئەم بەرنامەیان پەیڕەو دەکرد، بەڵام هیچیان لە ئەقڵ‌و سینگ فراوانی‌و نەرمونیانیداو سیاسەت ڕێکوپێکیداو سازان لەگەڵ خەڵکیداو سەرناسی‌و حیساب کردن بۆ جێگەو پێگەیان‌و دڵنەوازیکردن‌و دەست بەسەر هێنانیاندا خۆیان لە شانی ئەو نەداوە.[1]

٢ـ دیوانە ناوەندیەکانی سەر بە (معاویە):

أـ دیوانی نامەکان: بریتی بوو لە دەزگایەکی چاودێر بەسەر نوسینی نامەو فەرمان‌و پەیمان‌و وەصیەت‌و بەڵگەنامەو پەیماننامەکانی خەلیفە بۆ کارمەندەکانی خۆی لە

١ الشهب اللامعة (ص: ٣١٠، ٣١١)، مروج الذهب (٣/٢٢٠، ٢٢٢).

هەرێمەکانی جیهانی ئیسلامداو بۆ ئەو ولاتە بیانیانەی پەیوەندیان لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامیدا بەستبوو.[١] (عبدالله ی کوڕی ئوسی غەسانی‌و زەمل ی کوڕی عەمروی عذری) بەناوبانگترین کەس بوون لەنێو ڕیزی ئەو کەسانەی لە سەردەمی (معاویە)دا چاودێری ئەم دەزگایەیان دەکرد، ئەم دوو کاتیبە لە سەرەتای خیلافەتی یەزیدیشدا لەسەر ئەم کارەیان بەردەوام بوون،[٢] پۆستەو گەیاندنی نامەکان بۆ والی ویلایەتەکان‌و سەرکردەکانی سوپاو دادوەرو سەرۆکی هۆزەکان سەر بە (معاویە) بووو ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی دەکرد.

ب ـ دیوانی مۆر:

هەتا نامەکانی دەوڵەتی ئیسلامی‌و نهێنیەکانی نێویان لە چاوی سیخوڕو دەستی خیانەتکار پارێزراو بن، (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) دیوانی (مۆر)ی دامەزراند،[٣] بەمە ئەو نامانەی بە ناوی (خەلیفە)وە بەڕێ دەکران لە ساختەو دەستکاریکردن‌و دەستی دەستی دەپارێزران، ئەمجا دیوان فراوان کراو بوو بە تۆمارێکی نامە بەڕێکراوەکان‌و، دەوڵەت بۆ وردبینی کردن‌و بەدواداچوون‌و ساغکردنەوەی فەرمانەکان‌و ئەو نامانەی پەیوەندیان بە ژمێریاری‌و خەرجکردنی پوڵ‌و پارەی نێوان بارەگای خیلافەت‌و هەرێمەکانی ئیسلامەوە هەبوو پشتی پێ دەبەست،[٤] بە هەمان شێوە ئەم دیوانە کاری وردبینی لەسەر دیوانەکانی تریش دەکردو هەڵەکانی بۆ دەخستنەڕوو.

دیوانی (مۆر)ی سەردەمی (معاویە) لە مۆری پێغەمبەر (ﷺ)و مۆری خەلیفەکان جیاواز بوو، مۆرکردنی پێغەمبەر (ﷺ) بە واتەی واژۆ دەهات‌و بەس، بەڵام وەکو دەبینین (مۆر)ی سەردەمی معاویەو چاخی دەوڵەتی ئومەوی لە جێی ئامرازێکی پشکنینی نامەکان‌و خوردکردنەوەی ئەو کردارانە بووە کە لە دیوانەکانی ترەوە دەردەچوون، (عبدالله ی کوڕی محصن ی حمیر)ی هەڵگرو ئەمینداری مۆرە گەورەکەی معاویە بوو، هۆی دروستکردن‌و داهێنانی ئەم جۆرە مۆرە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە: (معاویە) فەرمانی دا (١٠٠) هەزار بدرێت بە (عەمروی کوڕی زوبێر) تا قەرزەکانی پێ بداتەوە، فەرمانی خەرجکردنی ئەم بڕە پارەیەی لە نامەیەکدا حەواڵەی (زیادی بابیرا)ی کرد، (عەمرو) لە ڕێگا نامەکەی کردەوەو سەدەکەی

---

١ إدارة بلاد الشام في عهدين الراشدي والأموي (ص: ١٢٤).

٢ المصدر نفسه (ص: ١٥٦).

٣ الدولة الأموية المفترى عليها (ص: ٤٣٣).

٤ إدارة بلاد الشام في عهدين الراشدي والأموي (ص: ١٢٤).

کـردە دوو سـەد، کاتێـك (زیـاد) حیـسابی (عـەمرو)ی بـۆ (معاویـە) بـەرزکردەوە (معاویـە) لامـوجیمی لەمـە کـرد، ئیـدی (عـەمرو)ی گـرتو بەنـدی کـردو فـەرمانی پێکـرد پارەکـە بگەڕێنێتەوە، ئەمەو (عبدالله ی کوڕی زوبێر)ی برای پارەکەی بۆ دایەوە، جا (معاویـە) لـەو دەمەدا دیوانی مۆرو سەرمۆرکردنی[1] نامەی داهێنا، کە لە پێش ئەمەدا سەرقەپاغی نامـەکان مۆر نەدەکران.[2]

لە ڕاستیدا بارودۆخی سەردەمەکەو بەرەوپێشچوونو فراوانبوونی دەوڵـەتی ئیـسلامی لـە سەردەمی (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت)داو حەوجەبوونی خودی خەلیفـە بـۆ سیـستەمێکی نهێنی پارێزی پۆستەو گەیانـدنو چاودێریکردنی کاربەڕێوەبـەرانی دەوڵەتەکـەیو فەرمانـدە سـەربازیەکانی سـوپاکەی خوازیـاری سـەرەکی دامەزرانـدنی دیـوانێکی ئـاوا بـوون کـە نـاوی (دیوانی سەرمۆرکردن= دیوان الخاتم)ی لێنرا.[3]

ج ـ دیوانی پۆستەو گەیاندن (البريد):

مێژونوسان دەڵێن: (معاویەی کوڕی ئەبی سـوفیان) یەکـەمین کـەس بـوو کـە سیـستەمی (پۆستەو گەیاندن)ی لە دەوڵەتی ئیسلامیدا داناو فـەرمانی دا چـەند بنکەیـەك لـە ژمارەیـەك شوێندا دروست بکـرێنو ئەسـپی خۆشـڕەویان بـۆ تـەرخان بکـرێنو دوایـەش ڕێکـی خـستو پەرەی پێدا.[4] هەندێك سەرچاوە ئاماژە دەدەن کە ئەم سیستەمەی لە ڕۆم وەرگرتبێت.[5]

بە حوکمی بەرفراوانی دەوڵەتی ئیسلامی لـە سـەردەمی ئومەویدا کارەکـانی ئـەم دیوانـە پـەلوپۆدارو بـەرفراوان بـوون، خەلیفـەکانی ئومـەوی لـە پێنـاو چـاککردنو گەشـەپێدانیدا بایەخیان بەو ڕێگاو بانانەدا کە پۆستەچیانو نامەبەران هاموشۆیان پێدا دەکرد، ئـیتر وایـان چـاكو خـۆش کـردن کـە تـا بڵێـی دیـارو زانـراو بـن، خێراگەیـشتنی هەواڵـەکان بـۆ (شـام)ی مەڵبەنـدی خیلافـەت بەڵگەیـەکی گەورەیـە لەسـەر ڕێکوپێـك بـوونی ئـەو ڕێگاوبانانـە.[6] خزمەتگوزاریـەکانی دیـوانی (پۆسـتەوگەیاندن) لەسـەر کاروبارەکـانی حکومـەت کـورت

---

١ (خەتم= سەرمۆرکردن) بەم شێوەیە بوو: نامەکە لولپێچ دەکرا، مۆمی تـواوەو گڵی سوریان بە تێکەڵی لە لاتەنیشتی ئەو زەرفە دەدا کە نامەکەیان تێ دەهاویشت، ئەمجا مۆری خیلافەتیان لێ دەدا.

٢ إدارة بلاد الشام في العصر الأموي (ص: ٢٨٧)، مرويات خلافة (معاوية) (ص: ٧٥).

٣ مرويات خلافة (معاوية) (ص: ٧٦).

٤ إدارة بلاد الشام في عهدين الراشدي والأموي (ص: ١٧٥).

٥ المصدر نفسه (ص: ١٧٤).

٦ المصدر نفسه (ص: ١٧٥).

هەڵنەهاتبوون بەڵکو لە هەندێك کاتدا نامەی خەڵکانی تری لەم وڵات بۆ ئەو وڵاتە دەگواستەوە.[١] دەوڵەت لە سەردەمی معاویەدا لە هەردوو باروودۆخی جەنگو ئاشتیدا لە پۆستە بێ نیاز بوو، بەڵکو (پۆستەچی) بە یەکێك لە گرنگترین یاریدەدەرەکانی (خەلیفە) دەژمێردرا، هەندێك سەرچاوە ناوی چەند (پۆستەچی)یەکی سەردەمی (معاویە)یان باس کردوون، لەوانە: (نەصری کوڕی ذوبیان‌و کومەیت)، ئەم دووانە لە ڕۆژگاری معاویەدا لە دیوانی (پۆستەوگەیاندن)دا کاریان دەکردو هەواڵ‌و نامەکانی نێوان (شام‌و حیجاز)یان دەگواستنەوە.[٢] گرنگترین هۆکارەکانی گواستنەوە، بریتی بوو لە هێستر[٣]و ئەسپ،[٤] (معاویە) بە دامەزرێنەری دەزگای (پۆستەو گەیاندن) دادەنرێت لە ئیسلامدا، بە جۆرێك لە پێش ئەمەدا نامە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە لایەن (خەلیفە)وە لە ڕێی یەك تاکە کەسەوە کە پێی دەگوترا پەیامبەر (رسول) بۆ شوێنی مەبەست بەڕێ دەکرا، ئیدی بەم شێوازە ماوەیەکی زۆری دەخایاند تا نامەکە دەگەیشت، ئەو سیستەمەی (معاویە) لە بێزەنتیەکانەوە وەری گرت، نێوانی ڕێگاویانەکانی بۆ ماوەی دیاریکراو دابەش دەکردن، لە سنووری ماوەیەکدا بنکەیەك هەبووو ئەسپ‌و پۆستەچی نامەکانی خەلیفەی بۆ شوێنە جۆراوجۆرەکان دەگواستنەوەو ئیدی لەم بنکەوە بۆ ئەو بنکەو لە دەستی ئەم پۆستەچیەوە بۆ دەستی پۆستەچیەکەی تر، تا لە کۆتاییداو لە ماوەیەکی کورتدا نامەکان دەگەیشتن، ئەندازەی نێوانی دوو بنکەی پۆستەچی بریتی بوو لە چوار فەرسەخ، هەر (فەرسەخ)ێك بریتی بوو لە سێ (میل)و هەمووی دەیکرد دوازدە میل، واتە: نزیکەی بیست کیلۆمەتر، بەم ماوەیە دەگوترا: ماوەی پۆستە، بەم شێوازە نامەکە بەبێ ماندووبوونی زۆری پۆستەچی‌و بە خێراترین شێوە دەگەیشت، چونکە: پۆستەچی یان نامەبەر دەیتوانی ئەم ماوەیە بە ئاسانی ببڕێت‌و ئەوە جگە لەوە کە ئەگەر بە تەنیا لەم هێڵە کاری کردبایە دەیتوانی پۆستەچی تر لە جێی خۆی دابنێت، خودی سیستەمەکە پشودان‌و کورتی ماوەی ڕێ بڕینی بۆ (پۆستەچی) دەستەبەر کردبوو،[٥] (أبو هلال العسکری) دەڵێت: یەکەمین کەس (پۆستە)و ئاڵقەکانی

---

١ المصدر نفسه (ص: ١٧٥).

٢ المصدر نفسه (ص: ١٧٦).

٣ المصدر نفسه (ص: ١٧٦).

٤ العيون والحدائق (٨٢/٣)، إدارة بلاد الشام في عهدين الراشدي والأموي (ص: ١٧٦).

٥ الأمويين بين الشرق والغرب (١٠٠/١).

(گەیاندن)ی پێکەوە بەستنەوەو ماوەی پشودانی بۆ (پۆستەچی) دانا، (معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان) بووو (عبدالملك کوڕی مەروان) مەحکەمتری کرد.[1]

س ـ سیستەمی کاتیبەکان:

هەر یەکێك لەم دیوانانە کە بە گەورەترین دیوانی سەردەمی ئومەوی دادەنران (نامەکان، خەراج، جوند ،شورتە، دادوەری) سەرو کاتیبێکی تایبەتی خۆیان هەبوو، ژمارەیەك کارمەند تایبەتکرابوون بە لەبەرگردتنەوەی فەرمان‌و نامەکانی (خەلیفە)و دوای ئەوە دەپێچرانەوەو سەرۆکی دیوان سەرمۆری دەکردن، ئەمجا لە دیوانی (مۆردا) هەڵدەگیران،[2] (دیوانی مۆر) لەو دەمەوە لە لایەن (معاویە)وە دامەزرێنرا، تا نێوەڕاستەکانی (چاخی عەباسی) بە گەورەترین دیوانی دەوڵەت دادەنرا.[3] ئەم دیوانانە کاری وەزارەتیان ئەنجام دەدا، (دیوانی خەراج) کاری وەزارەتی دارایی دەکرد، (دیوانی شورتە) کاری وەزارەتی نێوخۆی دەکرد، (دیوانی دادوەری‌و قەزا) کاری وەزارەتی دادی دەکرد، بە هەمان شێوە (دیوانی نامەکان) کاروباری سکرتاریەتی ڕادەپەڕاندو (دیوانی مۆر) کاروبارەکانی (تۆمارو ئەرشیف)ی جێبەجێ دەکرد، هەر دیوانێك چەند کارمەندێکی کارامەی لە کاتیبی تایبەت هەبوون، نووسینەکانی (دیوانی خەراج) لە (عێراق) بە زمانی فارسی بوون، لە (شام‌و مصر) بە زمانی ڕۆمی بوون، ئەمە بەم شێوەیە مایەوە تا (عبدالملك ی کوڕی مەروان) سیستەمی نوسینەکانی کردنە عەرەبی.[4]

## دووەم: پێداگیری (معاویە) لەسەر چەسپاندنی هێمنایەتی لە خیلافەتەکەیدا:

(بەرقەرارکردنی ئاسایش) لە چوارگۆشەی جیهانی ئیسلامیدا لە لایەن (معاویە)وە یەکێك بوو لەو بنەمایانەی سیاسەتی (نێوخۆی) خۆی لەسەر دامەزراندبوو، ئەو لە پێناوی بەدەستهێنانی ئەم ئامانجەدا چەند هۆکارێکی ڕەچاو کردبوون:

١ـ دەرکەوان: (معاویە) یەکەم کەس بوو لە ئیسلامداو لە پێناوی دوورخستنەوەی ئەگەری دەستدرێژی کردنە سەری دەرکەوانی بۆ خۆی دانا،[5] ئەو لەو ماوە مێژووییەداو بە

---

١ الأوائل (ص: ٢٣٧).
٢ تأريخ الاسلام (١/٤٥٨).
٣ المصدر نفسه (١/٤٥٩).
٤ الأمويين بين الشرق والغرب (١/٢٠٢).
٥ إدارة بلاد الشام في عهدين الراشدي والأموي (ص: ١٠٢).

حوکمی دەرکەوتنی هەندێك ڕواڵەتی مەلیکایەتی پێیەوە پاساوی دانانی دەرکەوانی بۆ دەهێنرێتەوە، (إبن خلدون) سەبارەت بە دانانی دەرکەوان لە لایەن خەلیفەکانەوەو پێوەدانی دەرگا بەسەر خەڵکدا بەم جۆرە قسە دەکات: یەکەم شت کە لە دەوڵەتدا دەستی پێکرا مەسەلەی دەرگاو پێوەدانی بوو بەسەر جەماوەردا، (خەلیفەکان) دەترسان لە لایەن (خەواریج)و خەڵکانی ترەوە ڕەشەکوژ بکرێن، چۆن ئەمەیان بەسەر (عومەرو عەلیو معاویەو عەمروی کوڕی عاصو غەیری ئەوانیشدا) هێناوەو هەندێکیان لێ کوشتنو هەندێکیشیان دەربازیان بووە، ئەمە لەگەڵ ئەوەدا ئەگەر دەرگاکەیان بکردبایەوە قەرەباڵغیان لەسەر دروست دەبووو بەوانەوە سەرقاڵ دەبوونو ئیشە گرنگەکانی بەردەستیان پێ ڕایی نەدەکران، جا کەسێکیان دیاری دەکردو لەبەر دەرگا دایان دەناو ناوی (دەرکەوان)=(حاجب)یان لێ دەنا،[1] ئەوەی کەوا ڕاوبۆچوونی (إبن خلدون) بەهێز دەکات کە پێی وایە هۆکاری ئەمنی لە پشت دانانی (دەرکەوان)ەوە بووبێت ئەمەیە: کە (معاویە) دوای ئەوە (خەواریج) هەوڵیاندا ڕەشەکوژی بکەن، فەرمانی بە پاسەوانەکانی شەوو شورتە کرد کاتێك دەچێتە سوژدەوە لە ژوور سەریەوە بوەستن،[2] لە لایەکی ترەوە (معاویە)و (ئومەویەکان) لە (شام) دەژیان کە هاوسێی وڵاتی (ڕۆم) بووو ڕۆمەکانیش دوژمنی سەرسەختی ئەوان بوون، زیاد لەمەش دوژمنە هەڵگەڕاوە نێوخۆییەکانی (شیعەو خەواریج) لە وڵاتدا بڵاو ببوونەوەو جێی مەترسی بوون، ئەوان پێیان وابوو دەبێت ئاسایش بۆ ئەو دەوڵەتە ئیسلامیە جێگیر ببێت کە سێ لە خەلیفەکانی لە لایەن دوژمنانەوە ڕەشەکوژ کراون، بۆیە لە پێناوی ئەم ئامانجەدا جۆرێك لە جۆرەکانی (پاسەوانی کردنو خۆپاراستن)یان پەیڕەوکرد،[3] مێژوونوسەکان ناوی چوار خزمەتکاری معاویەیان هێناون کە ئەرکی (دەرکەوان)یان بۆ ئەنجام داوە، ئەوانیش (سەعدو أبو أیوبو صفوان)[4] بوون، مەرج بوو لەسەر دەرکەوان تا بزانێ ڕێگا بە کێ دەداتو ڕێگەی چوونە ژوورەوە بە کێ نادات: سەرناس بێتو چەکەو بنەچەکەی خەڵکو هۆزو تیرەو تەواوی چینەکان بناسێت، هەواڵگەلێکی زۆر گێڕدراونەوەو جەخت لەسەر ئەمە دەکەنەوە، (حصین کوڕی منذر) دواهەمین کەس دەبێت دەچێتە

---

١ تأریخ إبن خلدون (٢/٤٩، ١٥٠).

٢ تأریخ الطبری (٦/٦٥).

٣ الدولة الأمویة المفتری علیها (ص: ٢٧١).

٤ إدارة بلاد الشام فی عهدین الراشدی والأموی (ص: ١٠٣).

ژوورەوە، (معاویە) پێی دەڵێت: ئەی (ئەبا ساسان) دەڵێی بەڕێکوپێکی ڕێگەی هاتنە ژوورەوەت پێ نادەن؟ ئەویش بەم شیعرە وەڵامی دایەوە:

وكل خفيف الساق يسعى مشمراً إذا فتح البـواب بـابك أصبعـاً
ونحـن الجلوس الماكثون رزانة وحلماً إلى أن يفتح الباب أجمعاً[1]

واتە: هەر کە دەرکەوان بە پەنجە دەرگاکەی بە حاڵو بەلا کردەوە، قاچ باریکە ئاقڵسوکەکان گورج خۆ تێ ڕۆدەکەن، ئێمە کە بە سەنگینی لە جێی خۆمان دانیشتووینو چاوەڕێ دەکەین، هەر دەمایەك دەرگاکە بە تەواوی خرایە سەر پشت، ئەمجا بە سەنگینیو ئەسپایی دێینە ژوورەوە.

کاتێك (شەریکی حارثی) هاتە لای (معاویە)، (معاویە) پێی گوت: تۆ کێی؟ وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران هەتا ئێستا بێ زەینیم بە تۆوە نەدیوە، چۆن وێنەی جەنابت کەسێکی وەك منی نێو ڕەعیەتی خۆی ناناسێت؟ (معاویە) پێی وت: ناسینی تۆ جیاوازی تێدایە، لەنێو خەڵکدا بە دەموچاوت دەتناسم، ئەگەر ناویان باسکردن بە ناوت دەتناسم، بەڵام ناوێکیان پێداوم لەگەڵ ئەو بیچمو ناوەدا یەك ناگرێتەوە کە ناسینی تۆیان لە زەینی مندا لە خۆ گرتووە.[2]

ئیدی دەرکەوان هەواڵی هاتنی کەسەکانی بە (خەلیفە) دەداو (خەلیفە)ش ڕێگەی دەدا یان ڕێگەی نەدەدا، ڕۆژێکیان (ئەحنەفی کوڕی قەیس)و (محمدی کوڕی ئەشعەث) لەبەر دەرگای (معاویەی یەکەم) ڕاوەستابوون، سەرەتا بانگی (ئەحنەف) کراو دوای ئەویش بانگی (ئەشعەث) کرا، ئەشعەث پەلەی کردو پێش ئەحنەفی دایەوەو چووە ژوورەوە، کە (معاویە) ئەحنەفی بینی مەراقی لەمە خواردو لای بە لای (ئەحنەف)دا کردەوەو وتی: بە خوا من ڕێگەم بە ئەو نەداوە پێش تۆ بێتە ژوورەوە، من دەمەویست پێش ئەو بێیتە لام، من چۆن سەرپەرشتی کاروبارتان دەکەم، ئاواش سەرپەرشتی خووخدەتان دەکەم، هەر کەسێکی زێدەڕۆ هەنگاوێك زیاد لە مافی خۆی هەڵدێنێت-و دەیەوێت لە خەڵك پێشکەوێتەوە- تەنها لەبەر ئەوەیە کەموکوڕییەك لە ناخی خۆیدا شك دەبات.[3]

---

١ التبيان والتبيين (٢/٢٩٠)، إدارة بلاد الشام (ص: ١٠٨).

٢ عيون الأخبار (١/٩٠).

٣ العقد الفريد (١/٦٨)، إدارة بلاد الشام في عهدين (ص: ١١٨).

٢ـ پاسەوان: (معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان) یەکەم کەس بوو لە دەوڵەتی ئیسلامدا (پاسەوان)ی بۆ خۆی دانان، ئەو پاش ئەوەی زانی (خەواریج) دەیانەوێت بیکوژن ئەمەی کردو فەرمانی دا لەسەر بانی مزگەوتەکانو ڕێگاوبانەکان هۆدەی بچوك بۆ پاسەوانەکان دروست بکرێنو کونە مەتەرێزیان بۆ لێ بدرێنو جگە لە پاسەوانەکانیو خەڵکانی جێ متمانەی خۆی نابێت کەسێکی تر بچێتە نێویانەوە،[1] وەکو دیارە (معاویە) بەس بە ڕاگرتنی (پاسەوان) وازی نەهێناوە، بەڵکو لە پێناوی پاراستنی خۆی لە هەر دەستدرێژیەکی دوژمنکارانە کە دەکرێتە سەری چەند پاسگایەکیشی دروست کردن.[2]

کتێبەکانی مێژوو ناوی سەرۆکی پاسەوانەکانی سەردەمی معاویەیان بۆ تۆمارکردووین کە ئەمانە بوون: (المختار: أبو المخارق[3]، یزیدی کوڕی حارثی عەبەسی).[4]

٣ـ شورطە (پۆلیس):

ئەرکەکانی شورطە بریتی بوون لە: پاراستنی ئاسایشی نێوخۆو دامو دەزگاکانی حوکومەتو، بەرگریکردن لە (خەلیفە)و دەستگیرکردنی دزو جەردەو تاوانبارو گەندەڵکاران، ئەو لە بەرانبەر ئەو هێرشانەی لە لایەن دوژمنی دەرەکیەوە دەکرانەسەر دەوڵەت بەرپرسیار نەبوو،[5] ئەمەو (معاویە) لە شامدا ڕێکی خستو گەشەی پێدا، مێژوونوسان ناوی چوار کەسیان هێناون کە پۆستی سەرلاۆکایەتیکردنی شورتەی پێداون: (قەیسی کوڕی حەمزەی هەمەدانی، زمل ی کوڕی عەمروی عوذری، زوحاکی کوڕی قەیسی فەهری، یەزیدی کوڕی حوڕی عەنسی)[6]، هەبوونی (شورتە) بەس لە پایتەختدا کروت هەڵنەهاتبوو، بەڵکو لە تەواوی ویلایەتە ئیسلامیەکانی تردا هەبوونو سەر بە والیەکان بوونو ئەوان هەڵیان دەبژاردنو دایاندەمەزراند، ئیدی لە هەر کۆمەڵگایەکی جیهانی ئیسلامدا دەزگای دەوڵەت هەبووایە بەپێی قەبارەی خۆی هێزی شورتەی لێ هەبوو، دەوڵەت بۆ

---

١ إدارة بلاد الشام (ص: ١١١).

٢ المصدر نفسه (ص: ١١١).

٣ البداية والنهاية (٤٦٥/١١).

٤ إدارة بلاد الشام في عهدين الراشدي والأموي (ص: ١١٧)، العقد الفريد (٣٦٢/٤).

٥ المصدر نفسه (ص: ١١٥).

٦ المصدر نفسه (ص: ١١٧).

سەرکوتکردنەوەی خەڵکانی هەڵگەڕاوەو کپکردنەوەی ئاگرەکانی شۆڕش‌و، قەڵاچۆکردنی ئاژاوەو هاڵۆزی پشتی بەم هێز دەبەست، جاروبارەش لە کاتی غەزاو فەتحی وڵاتاندا جێگەی سوپای دەگرتەوەو بۆشاییەکانی ئەوی پڕشدەکردەوە، (هێزی شورتە) ملکی کۆمەڵگا بوو، چونکە لە پێناوی بەرقەرارکردنی اسایشی نێو کاری دەکرد، ئەو تاکە هێزێك بوو کە لە بەرنبەر پاراستنی گیان‌و سامان‌و تەواوی مافی خەڵك بەرپرسیار بێت‌و نەیەڵێت لەنێو خۆیاندا دەستدرێژی بکەنە سەر یەکتر، خەلیفەکانی (ئومەوی) سەرانی (دەزگای شورتە)یان ڕادەسپارد لەنێو خۆو دەرەوەی وڵاتی (شام)دا کاریان بۆ ڕاپەڕێنن، (معاویە) (زوخاکی کوڕی قەیس)ی ڕادەسپارد وەصێتەکەی مەڕ (یەزید)ی بۆ ڕابگەیەنێت‌و بەیعەتی بۆ لە خەڵك وەربگرێت.[1]

٤ـ گوڵبژێرکردنی پیاوان:

(معاویە) بۆ هەڵسوڕاندنی کاروبارەکانی دەوڵەتەکەی لە هەڵبژاردنی کارمەندو کاربەڕێوەبەری متمانەپێکراوو شارەزاو سەرڕاست‌و زاناو داناودا سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێنابوو، چەند ناوێك بە نموونە دەخەینەڕوو: (عەمروی کوڕی عاصی سەهمی، موغیرەی کوڕی شوعبەی ثەقەفی،زیان بن أبیە الثقفي، یەزیدی کوڕی حوڕی عەبەسی، زوحاکی کوڕی قەیسی فەهری، عبدالله ی کوڕی عامری کوڕی کرین) جگە لەمانەش چەند سەرکردەیەکی سەربازی وەك: (موهەللەبی کوڕی ئەبی صفرە، عوقبەی کوڕی نافعی فەهری، مالیکی کوڕی هەبیرە، جەنادەی کوڕی ئومەییەی ئەزدی‌و چەندانی تر)، (عەمروی کوڕی عاص) دەیگوت: (من) بۆ زانین‌و ناسینی دەستبەجێ، (معاویە) بۆ وردبینی‌و دووربینی‌و دڵ‌و مێشك فراوانی، (موغیرە) بۆ کردنەوەی گرێ کوێرەکان، (زیاد) بۆ تەواوی کارە بچووك‌و گەورەکان،[2] هەموو ئەمانە لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی دەوڵەتداو وەستانەوە لە بەرانبەر دوژمنەکانیداو بەرەو پێشبردنی بزوتنەوەی (فتوحات)دا بەشداری بەرچاویان هەبوو، لە بەرقەرارکردنی هێمنی‌و ئاسایشداو جێگیرکردن‌و ڕاگرتنی پایەکانی خیلافەتی ئومەویدا ڕۆڵی گەورەو گرنگی خۆیان گێڕا.[3]

---

١ المصدر نفسه (ص: ١٢٣)، الأخبار الطوال (٢٠٥، ٢٠٦).

٢ أنساب الأشراف (١٣١/١/٤).

٣ الجذور التأريخية للأسرة الأموية (ص: ١٠٠).

٥ــ بەکارهێنانی سامان بۆ دڵنەوازیکردنی پشتیوانان‌و لایەنگران:

(معاویە) یەکێك بوو لە دڵاوایانی عەرەب، ئەو بە بەخشینی پارەو سامان‌و بەکارهێنانی سیاسەتی مەدارسازی، دڵەکانی بە لای خۆیدا کەمەنکێش کردبوون، ئەگەر هەواڵی پێ درابایە کە کەسێك ناڕەزایە، پارەی بۆ دەناردو بێ دەنگی دەکرد.[١]

٦ــ پەیڕەوکردنی سیاسەتی توندی‌و نەرمی: لە یەك کاتداو بە گوێرەی خواستی بارودۆخ، ئەم سیاسەتە دوابەدوای سەقامگیربوونی پایەکانی خیلافەتی ئومەوی هاتە ئاراوە، (معاویە) سەبارەت بە ئەمە بۆ (زیاد بن أبیە)ی نوسی: دروست نیە من‌و تۆ بە یەکڕەنگ سیاسەتی خەڵك بکەین، ئەگەر هەموومان توندی‌و ڕەقی بەکاربێنین خەڵك تەنگاو دەکەین‌و لەنێویان دەبەین، ئەگەر نەرمونیانیش بین لەگەڵیان تووشی خۆبەزلزانی‌و سەرکەشییان دەکەین، بەڵام تۆ نەرم‌و شلی بنوێنەو منیش توندو ڕەقی دەنوێنم، کە تۆش تون‌و ڕەقیت بەکارهێنا منیش نەرم‌و شلی بەکاردەهێنم،[٢] ئەم سیاسەتە لەم وتانەدا کە لە زمانی (معاویە)وە گێڕدراونەتەوە چاکتر ڕەنگ دەداتەوە، وەك دەڵێت: هەتا زمانم بەش بکات قەمچی بەکارناهێنم، هەتا قەمچیەکەم بەشم بکات شمشێرەکەم بەکارناخەم، ئەگەر جگە لە شمشێریش هیچ شتێکی تر دادی نەدام ناچار بەکاری دەهێنم.[٣] ئەمەش وتەیەکی تری بەناوبانگیەتی: ئەگەر داوە موویەك لە نێوان من‌و خەڵکدا هەبوویێت نەپساوە، کە ڕایانکێشاوە لە دوامداون، کە دەستیان لێ شل کردووە ڕامکێشاوە.[٤]

٧ـــ پەیڕەوکردنی سیاسەتی بەرژەوەندی دوو لایەنە لە نێوان (بەنی ئومەییە)و (ڕەعیەت)دا:

معاویە (خودا لێی ڕازی بێت) نەیتوانی پەیڕەوی سیاسەتە سەرراستەکەی (أبوبکرو عمرو عوسمان‌و عەلی) (خودا لێیان ڕازی بێت) بکات، بێگومان زۆربوونی سەروەت‌و سامان پاش فراوانبوونی قەڵەمڕەوی دەوڵەتی ئیسلامی زۆرێك لە موسڵمانانی وادار کرد لەم داهاتە بەرفراوانەی ڕۆژ بە ڕۆژ بە سەریاندا دەڕژاو لە بەرپێیانیان هەڵدەقوڵی سوودمەند بن، (معاویە) بە ڕوون‌و ڕاشکاوی ئەمەی دەربڕی‌و بە موسڵمانانی وت: ..... بەڵام من ڕێگایەکم

---

١ المصدر نفسه (ص: ١٠٠).

٢ أنساب الأشراف (٨٤/١/٤).

٣ الجذور التأريخية للأسرة الأموية (ص: ١٠١).

٤ أنساب الأشراف (٢١/١/٤).

گرتووەتەبەر هەم بەرژەوەندی منی تێدایەو هەم سوودو بەرژەوەندی ئێوەشی لەخۆدا گرتووە، هەر کەسێکمان ڕێرەوشتی ڕێك‌و پاك بێت‌و فەرمانبەرداریەکی چاکی هەبێت بەشە خواردن‌و خواردنەوەیەکی زۆر باش‌و جوانی هەیە، ئەگەر باشترین کەسیشتان نەبم، هەوڵ دەدەم بۆتان باش بم.[١]

٨ـ بەناوبانگکردنی خیلافەتەکەی‌و ڕاکێشانی جەماوەر لە ڕێی بەکارهێنانی سیاسەتی پڕوپاگەندەو ڕاگەیاندن:

(معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان) دەیگوت: خۆشەویستترین کەس بە لای منەوە، ئەو کەسەیە بە لای خەڵکەوە خۆشەویستم دەکات،[٢] خەلیفەکانی ئومەویش دوابەدوای ئەو هەمان سیاسەتیان پەیڕەوکردو چەند (شاعیر)یان ڕادەگرتن‌و پارەو سامانی زۆرو زەوەندیان پێ دەدان، ئەمانیش لە بەرانبەرداو (بە هۆنراوەکانیان) ستایشیان دەکردن‌و بە خەڵکیان ڕادەگەیاند: کە ئەمان بۆ پۆستی (خیلافەت) شیاون‌و لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانیدا گونجاون، لەبەر ئەوە واجبە گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەرداریان لێ بکرێت‌و لە خۆشی‌و ناخۆشیدا سەربخرێن‌و پشتیوانیان لێ بکرێت، ئەمە لەگەڵ ئەوەدا کە دەبێت بزانین کە گرنگترین هۆکاری ڕاگەیاندن‌و پڕوپاگەندە لەو سەردەمەدا (هۆنراوە) بوو.[٣]

هەندێك لەو هۆنراوانەی لەم بوارەدا گوتراون:

(الأطحل) گوتوویەتی:

تمت جدورهم والله فضلهم　　وجدٌ قوم سواهم خامل نكد

وأنتم أهل بيت لا يوازنهم　　بيت إذا عُدَّت الأحسان والعدد[٤]

معاویە بایەخی بە هونەری (پڕوپاگەندەو ڕاگەیاندن) داو ئەم کارەی بە کەسانێك سپارد خەمی لێ بخۆن،لە پێناوی بەدەستهێنانی دەستکەوتی سیاسی‌و ئیعلامی‌و ئەمنی‌و ڕاکێشانی خەڵك بە لای خۆیدا پارەو سامانی دەدا بە شاعیران‌و سەرۆکهۆزەکان‌و دەستی والیەکانیشی کردبوونەوەو دەرفەتێکی فراوانی پێدابوون تا پڕۆسەکە سەرکەوتوو بێت. ئەمەو (زیاد)ی

١ سير أعلام النبلاء (١٤٨/٣).
٢ الجذور التأريخية للأسرة الأموية (ص: ١٠٢).
٣ المصدر نفسه (ص: ١٠٢)، تأريخ الطبري (٢٥٥/٦).
٤ التطور والتجديد في الشعر الأموي، شوقي ضيف (ص: ١٣٤).

والی (بەصرە) پێنج سەد پیاو ماقوڵ‌و خەڵکانی بەرچاوو دیاری شاری ناونوس کردو هەر یەك لەمانە سێ سەد تا پێنج سەد درهەم پارەی پێدەدان،[١] (حارثەی کوڕی بدر الغُدّاني) وتی:

ألا مـــن مبلـــغ عني زياداً فنعم أخو الخليفة والأمير

فأنت إمام معـــدلة وقصد وحزم حين تحضرك الأمور

أخوك خليفة الله بن حرب وأنت وزيرهُ نعم الوزير[٢]

معاویە (خودا لێـی ڕازی بێـت) هـەوڵی دەدا بەبـەکارهێنانی ئـاوەزی فراوانـی‌و لێبـوردن‌و نـەرمونیانی تـوڕەیی شـاعیران بنیـشێنێتەوە، دەڵـێن (إبـن مفـرغ حمیـدی)ی شـاعیر لەگـەڵ (عبادی کوڕی زیاد) لە (سوجستان) دەبێ، لەو دەمەدا (عوبادی کـوڕ زیـاد) لـە شـەڕی گـەڵ (تورك)دا خەریکی شکستخواردن دەبێ، ئـالیکی ئەسـپەکانیان کۆتـایی پـێ دێـت‌و تەنگـەتاو دەبن، سەبارەت بە ئەمە (إبـن مفـرغ) عوبـادی کـوڕی زیـاد تاوانبـار دەکـات‌و بـەم شـێوەیە هەجوی دەکات:

ألا ليت اللحى عادت حشيشا فنعلفها خيول المسلمين

واتە: خۆزگە ئەو ڕیشە دەبوەوە بە پووش و دە مانکرد بە ئالیك و ئەسـپی موسـڵمانانمان لەسەر دەلەوەڕاندن

(عوبادی کوڕی زیاد) ڕیشی گـەورە بـوو، کەسـانێك شـێعرەکەیان پـێ ڕاگەیانـد گوتیـان: تەنها مەبەستی تـۆ بـووە، (عوبـاد) بـە دوای (إبـن المفـرغ)یـدا نـارد، بـە دەمیـەوە نـەهات‌و هەڵات‌و، ئیدی بە شیعرێکی زۆر هەجوی کردو شڕی کرد، یەکی تر لەو شێعرانە:

إذا أودى (معاوية) بن حرب فستر شعب قبعك بـانصداع

فاشهد أن أمـك لم تبـــاشر أبـــا سفيان واضعـــة القناع

ولـــكن أمـــراً فيـــه لـــبس عـــلى وجـــل شديد وإرتياع

هەروەها دەبێژێت:

ألا أبلغ (معاوية) بـــن حرب مغلغلة من الرجل اليمـــاني

أتغضب أن يقال أبوك عَفٌّ وترضى أن يقال أبـوك زان

فاشهد أن رحمك مـــن زياد كرحم الفيل من ولـد الأتان[٣]

١ تأريخ الطبري (١٣٩/٦).
٢ تأريخ الطبري (١٣٩/٦).
٣ تأريخ الطبري (٢٣٦/٦).

هەر کە (إبن مفرغ) شێعرە هەجوئامێزەکەی خۆی لە (عوبادی کوڕی زیاد) گرتن، بەرەو (بەصرە) هەڵات، (عوباد) نامەی بۆ (عبیداللە)ی برای نووسی‌و هەندێك لەو شیعرانەشی تێدا نوسیبوون، لەو دەمەدا (عبیداللە) نامەکەی پێ گەیشت چوو بووە (شام)و لە لای (معاویە) بوو، (عبیداللە) شیعرەکانی بۆ (معاویە) خوێندنەوەو داوای لێ کرد مۆڵەتی بدات، (إبن مفرغ) بکوژێت، (معاویە) ڕێی پێ نەداو پێی گوت: تەمبێ بکەو مەیکوژە[1]... ئەمەو (إبن المفرغ) کەوتە بەردەستی (عبیداللە)، دەرمانێکی ڕەوانکەری بە گەرودا کرد، ئەمجا سواری کەرێکی کورتانکراوی کردو بەنێو خەڵکدا دەیگێڕا، بەردەوامیش پیسایی بە خۆیدا دەکردو دەیتوڕاند.[2]

(إبن مفرغ) بە (عبیداللە)ی گوت:

| | |
|---|---|
| يُغسل الماء ما صنعـــت وقولي | راســـخ منك في العظام البوالي |

ئەمجا (عبیداللە) ناردیەوە بۆ لای (عوباد)ی برای لە (سوجستان)، تایەفەی (یەمەنی) (شام) چوونە لای (معاویە)و تکایان لێکردو بۆی پاڕانەوە ،(معاویە)ش یەکسەر وەڵامی بۆ (عوباد) نارد، (إبن مفرغ)ی بۆ لا بەرێ بکات، (إبن مفرغ) لە ڕێگادا ئەمەی گوت:

| | |
|---|---|
| عـدس مـــالعبـــاد عليك إمارة | نجوت وهـذا تحملـــين طليـــق |
| لعمري لقد نجـاك من هوة الردي | إمـــــام وحبل للأنام وثيـــق |
| سأشكر ماأوتيت من حسن نعمة | ومثلي بشكر المنعمين حقيـــق |

کاتێك گەیشتە (شام)و چووە لای (معاویە) دەستی بە گریان کردو وتی: بەبێ گوناهو تاوان ئەوەی بەسەر من هێنراوە بەسەر کەس نەهێراوە......، دوای گفتوگۆیەك (معاویە) پێی گوت: بڕۆ لە خۆت‌و تاوانت خۆش بووین، هیچ کارێکت لای ئێمە نیە، حەزت لە کوێیە، لەوێ نیشتەجێ بە، ئەویش چووە (موصل)و لەوێ نیشتەجێ بوو، پاشان بەرەو (بەصرە) ملی لێنا، چووە لای (عبیداللە)و داڵدەیدا.[3]

معاویە (خودا لێی ڕازی بێت) کاری لەسەر (شاعیران) دەکردو دەیویست بە لای خۆیدا ڕایانکێشێت‌و خراپەیان لێ دوور بخاتەوەو بە ڕێزلێنان‌و پارەو سامان خۆی لە لای خۆشەویست‌و شیرین دەکردن، شاعیرانی ئەو سەردەمە زۆر بە کەناڵە ئاسمانیەکانی ئێستا دەچوون.

---

١ المصدر نفسه (٦/٢٣٦).
٢ المصدر نفسه (٦/٢٣٦).
٣ تأريخ الطبري (٦/٢٣٨).

٩ـ دەزگای هەواڵگری (موخابەرات):

دامو دەزگاکانی ئاسایشی نێوخۆو دەرەوە لە سەردەمی (معاویە)دا گەلێك بەهێزو چالاك بوون، لە کۆکردنەوەی زانیاریدا دەستڕۆیشتوو سەرکەوتوو بوون، (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) بە خودی خۆی سەرپەرشتی دەزگای (هەواڵگری) دەکرد، بە خاتری چاودێریکردنی والی‌و ڕەعیەتەکانیان دەزگایەکی نهێنی تایبەت بە خۆسی دانابوو، لە هەر هەرێم‌و ناوچەیەکدا کاربەڕێوەبەرێکی یان سوپاسالارێکی هەبووبێ چاودێرێکی نهێنیشی بە سەرەوە داناوە، تا کار بەوە گەیشتبوو چاودێرو هەواڵگیرە تایبەتەکانی خۆیان گەیاندبووە دامو دەزگاو کۆشك‌و تەلارەکانی دەوڵەتی (بێزەنتی)یش، چەند بەڵگەیەك لەسەر ئەمە:

أـ ئاگاداربوونی بەسەر نامەو نامەکاریەکانی نێوان (حوسەین)و (دانیشتوانی عێراق):

کاتێك (حەسەنی کوڕی عەلی) کۆچی دوایی کرد، شیعەکان لە ماڵی (سلێمانی کوڕی صەرد) کۆبوونەوەو پرسەنامەیەکیان بەم بۆنەوە بۆ (حوسەین) نارد، لە نامەکەدا هاتبوو: (خودا لەنێو ئەوانەدا کە ڕابوردن گەورەترین کەسایەتی لە تۆدا خولقاندووە، ئێمەی شیعەش وەکو تۆ تووشی موسیبەت بووین، بە خەمباربوونت خەمبارین، بە شادومانیت شادومانین، چاوەڕێی فەرمانت دەکەین). (حوسەین)یش بەم چەشنە وەڵامی دانەوە: ئومێدەوارم ڕای براکەم کە بریتیە لە ئاشتەوایی‌و ڕای منیش کە بریتیە لە جیهادکردن لە دژی ستەمکاران کامڵ‌و ئامانجهەنگێو بن، هەتا کوڕەکەی هیند (واتە معاویە) زیندووەو لە ژیاندایە، خۆتان بە خاکەوە بنووسێنن‌و چاوی لێ بنوقێنن‌و لایەنگریتان بۆ من پەنهان بکەن‌و پاسەوانی‌و چاودێری منداڵەکانتان بکەن، ئەگەر معاویە هەر شتێکی بەسەرهات‌و من زیندوو بووم (إن شاء الله) فەرمانی منتان پێ دەگات.[1] ئەم نامەو نامەکاریانەی نێوان (حوسەین)و (خەڵکی کوفە) ترسیان خستە سەر (بەنی ئومەییە) لە شاردا، نامەیان بۆ معاویە ناردو سەبارەت بە (حوسەین) ڕاوێژیان پێ کرد، لە وەڵامدا بۆی نوسین کە بە هیچ شێوەیەك ڕووبەڕووی نابنەوەو نابێت خۆی تێ بگەیەنن،[2] معاویە لە نامەگۆڕینەوەکانی نێوان (حوسێن)و (خەڵکی کوفە)و پەیوەندی توندو تۆڵی نێوانیان ئاگادار بوو، لەبەر ئەمە داوای لە (حوسێن) کرد کە: با لە خودای بەرزو مەزن بترسێت‌و لەبەر خاتری خودا کاروباری

١ أنساب الأشراف (٣/١٥٢)، مواقف المعارضة (ص: ١٧٩).
٢ أنساب الأشراف (٣/١٥٢)، مواقف المعارضة (ص: ١٧٩).

موسڵمانان تێك نەداتو دابڕدابڕیان نەکات.[١](حوسێن) سەبارەت بەمە ڕوونو ئاشکرا بوو، ئەو بە ڕاشکاوی وتی: ئێمە بەیعەتمان داو پەیمانمان دا، هیچ بەڵگەیەك نیە بەیعەتەکەمان پێ هەڵوەشێنێتەوە،[٢] ئەمەو (حوسێن) (خودا لێی ڕازی بێت) لە تەواوی سەردەمی (معاویە)دا (خودا لێی ڕازی بێت) پابەندی ئەو بەیعەتە بوو کە دابووی.[٣]

ب ـ بەسەرهاتەکەی (معاویە) لەگەڵ (مسوری کوڕی مخرّمە):

(معاویە) بە (میسور)ی وت: ئەی (میسور) چ شتێك هانت دەدا توانج لە پێشەوایان بگری.[٤] ئەمە دەری دەخات کە معاویە لە وتەو قسەی کەسایەتیە گەورەکانی نێو کۆمەڵگای ئیسلامی ئاگادار بووە.

ج ـ بەسەرهاتی ئەو موسڵمانەی کە لە لای بێزەنتیەکان دیل کرابوو: وە بە بەرچاوی مەلیکی (ڕۆم)ەوە زللەی لێدراو ئەویش وتی: هاوار بۆ ئیسلام، هۆ معاویە تۆ لە کوێی، ئەمەو ئەم هەواڵە خێرا بە معاویە گەیشت،[٥] ئەمە چەند بەڵگەیەکن لەسەر بەهێزبوونی دەزگای (هەواڵگری)ی سەر بە دەوڵەتی (ئومەوی).

س ـ چاودێریکردنی هەڵسوکەوتی هەندێك لە شوێنکەوتووانی (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت):

سەرەتای کار (زیاد) بە هاسانی نەهاتە ژێر فەرمانی معاویەوە، بەڵکو لە ولاتی (فارس= ئێران) خۆی قایم کرد، ئەمەو دوای بێنەوبەرەو بگرەو بەردەیەکی زۆر معاویە توانی قەناعەتی پێ کات (لەمەولا بە ئیزنی خودا بە درێژی باسی ئەمە دەکرێت)، (زیاد) داوای لە معاویە کرد ڕێی پێ بدات لە (کوفە) نیشتەجێ ببێت، ئەویش ڕێی پێدا، کاتێك چووە (کوفە)، (موغیرە) ڕێزی دەگرتو بە گەورەی دادەنا، معاویە بۆ موغیرەی نوسی: (زیادو سلێمانی کوڕی صەردو حجری کوڕی عەدیو شەبەتی کوڕی ڕەبعیو إبن الکواءو عمری کوڕی الحمق) بگرەو با لە نوێژی (جەماعەت)دا لەگەڵت بن، ئیدی ئەمانە هەموو نوێژەکان

١ أنساب الأشراف (١٥٢/٣)، مواقف المعارضة (ص: ١٨٠).
٢ الأخبار الطوال (ص: ٣٢).
٣ أثر العلماء في الحياة السياسية في الدولة الأموية (ص: ٤٦٩).
٤ سير أعلام النبلاء (١٥١/٣).
٥ الشهب اللامعة في السياسة النافعة (ص: ٤٨٩).

ئامادەی (مەجاعەت) دەبوون،[1] معاویە بە جێبەجێکردنی ئەم بڕیارەی ئەم چەند کەسایەتیەی خستە ژێر چاودێرییەکی بەردەوامی والی (کوفە)وە، ئەو ئیحتیاتی خۆی کرد چونکە خەڵکانێك هەبوون بەرهەڵستی صوڵحەکەی (حەسەن)و (معاویە)یان دەکردو، هیچ بە دوور نەدەزانرا لە دەورەی یەکێك لە پیاوەکانی (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) کۆببنەوەو شۆڕش بکەن، ئیتر (معاویە) بەم هەنگاوەی ویستی هۆکارەکانی سەرهەڵدانی ئاشوب بنبڕ بکات.[2]

١٠ـ بایەخدان به دامەزراندنی سوپای ئیسلامی:

معاویە لەو کاتەوە بوو بە والی (شام)و بەر لەوەی پۆستی خیلافەت وەربگرێت‌و پاش ئەمەش تێڕوانینێکی سیاسیانەی دووری هەبوو بۆ دامەزراندنی (سوپایەکی بەهێز)ی نیزامی، بە جۆرێك بتوانێت ئاسایشی نێوخۆی ویلایەت بەرقەرار بکات‌و ئەمجا لەوێوە پەلوپۆ بهاوێژێت‌و چالاکیەکانی خۆی بگوازێتەوە بۆ دەرەوەی وڵات.[3] ئەمەو ئەمە لە سەردەمی ئەودا خۆی لە بزوتنەوەی (فتوحات)دا خستەڕوو، بە ئیزنی خودا لە شوێنی خۆیدا بە درێژی باسی دەکەین.

١١ـ سیاسەتی هاوسەنگی:

هەرچەندە هۆزی (کەلب) لەنێو دەوڵەتی معاویەدا دەستڕۆیشتوو بوون، بەڵام هاوسەنگیەکە لەسەر پایەی هاوپەیمانی (ئومەوی–کەلبی) ڕانەوەستابوو، لە سەردەمی معاویەدا هاوسەنگی لە نێوان هەردوو هۆزی (کەلب)و (فەهر) بە شێوەیەکی تایبەت‌و لە نێوان دوو هۆزی (قەحطان)و (قەیس) بە شێوەیەکی گشتی ڕاگیرابوو، (کەلبیەکان) کە لە باشووری شام (ئەردەن) نیشتەجێ ببوون باری بەرگری دەوڵەتیان بە شێوەی چەکداری خستبووە سەر شانی خۆیان، لە بەرانبەر ئەمانەشدا (فەهریەکان) جگە لە گێڕانی ڕۆڵی سەربازانەیان لە بواری سیاسەت‌و هەڵسوڕاندنی کاروبارەکانی دەوڵەتدا پشکی باش‌و بەرچاویان هەبوو، (زوحاك)ی سەرۆکیان بەشداری (صفین)ی کردو، بێ لەمەش یەکێك بوو

---

١ الكامل في التأريخ (٢/٤٥٨).

٢ مرويات خلافة معاوية (ص: ١٧٥).

٣ الدولة الأموية، د. فرست مرعي الدهوكي (ص: ٦٤).

لەو کەسانەی معاویە بۆ وەرگرتنی بەیعەت بۆ (یەزید)و هاندانی خەڵك بۆ ئەمە پشتی پێ بەستبوون.[١] ئەمەو (زوحاك) لە دەوڵەتی (ئومەوی)یدا پلەی بەرز بۆوەو معاویە لە بواری ئاسایشدا پۆستی سەرۆکی شورتەکانی خۆی پێدا،[٢] لە سەردەمی (یەزید)یشداو ڕۆڵی سیاسیانەی خۆی وەکو کاربەڕێوەبەری شاری (دیمەشق) گێڕا، ئەم جێگەوپێگە هەستیارو مەترسیدارە پێی گەیاندو بوو بە جێ متمانەی (معاویەی دووەم)و لە کاتی نەخۆشیەکەیدا وەصێتی بۆ کرد پێشنوێژی بۆ دانیشتوانی شاری (دیمەشق) بکات،[٣] بەم چەشنە دامەزرێنەری دەوڵەتی (ئومەوی) لە ڕێی ڕەچاوکردنی سیاسەتی هاوسەنگی نێوان هۆزە گەورەکانی (شام) توانی دەست لە جڵەوی دەسەڵات گیر بکات، ئەو ڕێگەی بە هەر کامێك لەم هۆزانە دا لە سنووری دیاریکراوو نەخشەبۆداڕێژراوی خۆیدا ڕۆڵی گەورەو بەرچاوی خۆی بگێڕێت، کە لە نێویاندا هۆزی (کەلبی) گەورەترین کاریگەری لەسەر ڕووداوەکان هەبوو، ئەمەو بازنەی ئەم سیاسەتە هێند فراوان بووو بوو بە دیاردەیەکی گەورەی نێو دیاردەکانی سەردەمی معاویە (خودا لێی ڕازی بێت).

توانی هاوسەنگی نێوان هۆزی قورەیش (کۆچەرانو کۆچنەکەران)و خودی بنەماڵەی ئومەوی (بنو حربو بنو العاص) ڕابگرێت، (ثەقەفی)یەکانی بە لای خۆیدا ڕاکێشانو ئیدارەی (عێراق)ی پێدانو مێژووی خۆی بەم بنەماڵەوە بەستەوەو ئیدی لە هەموو بوارەکانەوە حیسابی بۆ هاوسەنگی کردو بەم سیاسەتەی توانی لە ڕێکوپێککردنی کاروبارەکانیدا سەرکەوتنی گەورە بەدەست بێنێت.[٤]

١٢ـ سیاسەتی لە بەرانبەر خانەوادەی (ئومەوی)دا:

معاویە (خودا لێی ڕازی بێت) بە پشتیوانی مادی یان مەعنەوی خانەوادەی (ئومەوی) پۆستی خیلافەتی وەرنەگرت، بەڵکو خەڵکی (شام) کە کۆمەڵە هۆزێکی یەکگرتوو و پێکەوە جۆشدراو بوون پشتگیریان لێکردو سەریان خست، لەبەر ئەمە نابینین لە سەردەمی ئەودا

---

١ الطبقات (٢٢/٦).

٢ مؤتمر الجابية، إبراهيم بيضون، جمهرة النسب، إبن الكلبي (٤٧١/١).

٣ الطبقات (٣٩/٦)، مؤتمر الجابية (ص: ٣٥).

٤ مؤتمر الجابية (ص: ٣٦).

بنەماڵەی (ئومەوی) ڕۆڵێکی دیارو بەرچاویان لە بوارەکانی ئیداری‌و سەربازیدا هەبووبێت، ئەم ڕاستیە حاشا هەڵنەگرە لە ماوەی خستنەڕووی ناوی ئەو والی‌و سەرکردە سەربازیانەدا دەردەکەوێت کە معاویە پشتی پێ بەستبوون،[1] ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە ئەو لە بەرانبەر بنەماڵەکەی خۆیدا بە تەواوەتی وشك‌و برینگ بووبێت، نەخێر، بەڵکو پشتی بە هەندێك خزمی خۆی بەستبوو، بەڵام دوو ئامانجی لەبەر چاوی خۆی دانابوون:

أ- پشتبەستن‌و کۆمەکی خواستن لە خەڵکانی شایستەو لێوەشاوەی نێو بنەماڵەکەی.

ب، ج - نەبادا ببنە مایەی هەڕەشە بۆ سەر نەخشە سیاسیەکانی... بەری بە فراژوبوونی دەسەڵاتی ئەوان دەگرت.[2]

لە ڕاستیدا معاویە بە هەموو تواناو سیفەتە بەرزو ناوازە سەرکردەییەکانیەوە توانی یەکێتی‌و یەکڕیزی بۆ بنەماڵەی (ئومەوی) بە ئەنجام بگەیەنێت.[3]

ئەمانەی ڕابوردن بریتی بوو لە گرنگترین هۆکارو ڕێوشوێن (معاویە) لە پێناو سەقامگیرکردنی ئاسایش بۆ دەوڵەتەکەی گرتنیەبەر.

---

١ بە ئیزنی خودا لە شوێنی خۆیاندا لە میانەی باسی والیەکاندا ناوەکانیان دەگوترێن.

٢ الدولة الأموية، فرست مرعي (ص: ١٧٩).

٣ المصدر نفسه (ص: ١٨٠).

# باسی سێیەم

## ژیانی ( معاویە ) لەنێو کۆمەڵگاو بایەخدانە زانستیەکانی

### یەکەم: ژیانی ( معاویە ) لە کۆمەڵگادا:

١ـ نێوانی (معاویە)و (عەمروی کوڕی عاص):

(عەمروی کوڕی عاص) بە (معاویە)ی وت: ئەی ئەمیری ئیمانداران: من دڵسۆزترین کەس نیم بۆ تۆ؟ (معاویە) وتی: بەهۆی ئەمەوەیە ئەم پلەی ئێستات بەدەست هێناوە.[١]

٢ـ دەمەقاڵەو هەرایەك لە مەجلیسی (معاویە)دا:

لە (جویریة)ی کوڕی (أسماء)ەوە وتی: (بوسری کوڕی أبي أرطأة) لە لای (معاویە) دەمدرێژی کردە سەر (عەلی کوڕی ئەبو تالیب)، (زەیدی کوڕی عمری کوڕی خطاب) لەوێ دەبێت وگۆچانێك بە تەپڵی سەری (بوسر)را دەکێشێتو سەری دەشکێنێت، (معاویە) بە (زەیدی) وت: چۆن بە گژ پیرێکی (قورەیش)و سەرگەورەیەکی خەڵکی (شام)دا دەچیو لێی دەدەی؟!، ئەمجا ڕووی لە (بوسر) کردو وتی: چۆن قسە بە (عەلی) دەڵێی کە باپیرەتی؟!، نازانی کوڕی (فاروق)ی سەرداری خەڵکەو لە بەرانبەر ئەمەدا خۆی پێ ناگیرێت؟! ئەمجا هەردووکی ڕازی کردنو پێکی ئاشت کردنەوە.[٢]

٣ـ من بۆ ئەمە لە تۆ موستەهەقترم:

معاویە وتی: بە لای منەوە هیچ شتێك جوانتر نیە لە کانیاوێك هەڵدەقوڵێتو بەسەر خاکێکی دەشتو نەرمدا پەخشان دەبێت، (عەمروی کوڕی عاص) وتی: بە لای من هیچ شتێك خۆشتر نیە لەوە بە سیفەتی زاوا شەوی یەکەم لەگەڵ کچە عەرەبێکی عاقڵ بکەمەوە. (وردان)ی خزمەتکاری (عەمروی کوڕی عاص) وتی: بە لای منەوە هیچ شتێك لە چاکەکردن لە بەرانبەر دۆستو برایان خۆشەویستتر نیە، (معاویە) وتی: من بۆ ئەمە لە تۆ لە پێشترم، وتی: کەواتە تۆ چت پێ خۆشە منیش ئەوە دەکەم.[٣]

٤ـ هەواڵی نزیکبوونەوەی وادەی مەرگی خۆمی پێداوم:

هەر جارێك کاربەڕێوەبەری (مەدینە) پۆستەچی بۆ لای (معاویە) ساز دەکرد، فەرمانی بە جارچی دەکرد، جاڕ بدات: هەر کەسێك پێویستیەکی هەیە با نامە بۆ ئەمیری ئیمانداران

---

١ تأريخ الطبري (٦/٢٥٣).

٢ المصدر نفسه (٦/٢٥٣).

٣ المصدر نفسه (٦/٢٥٤).

بنووسێت، جا (زیری کوڕی حوبەیش) یان (ئەیمەنی کوڕی خورەیم) نامەیەکی ناسکی نووسیو هەڵیدایە نێو نامەکانەوەو ئەم هۆنراوەیەی تێدا بوو:

إذا الرجـــال ولـــدت أولادهـــا      واضطربت من كبر أعضادها

وجعلت أسقـــامهـــا تعتـــادهـــا      فهي زروع قـــد دنا حصادها

که نامەکانی پێگەیشتنو سەرە گەیشتە سەر ئەم نامەیەو خوێندیەوە، وتی: هەواڵی مەرگمی داومێ.[1]

٥ـ ئامۆژگاری (معاویە) بۆ شاعیرێکی (بەنی ئومەییە):

معاویە (خودا لێی ڕازی بێت) بە (عبدالرحمن ی کوڕی حەکەمی کوڕی ئەبیلعاص)ی گوت: ئەی برازای خۆم: تۆ زمانت بە هۆنراوە ڕاهاتووە، خۆت لە شێعری دڵداری بە دوور بگرە نەبادا حورمەی ڕوو سوور لەکەدار بکەی، خۆت لە شێعری (هجاء) بپارێزە نەبادا پیاوی بەڕێز قێزەون بکەیو پیاوی بێ ڕێزیش بوروژێنیت، خۆ لە شێعری (مەتحو پێداهەلگوتن) بپارێزە، چونکە ئەمە پارووی چەوری مرۆڤی ناشیرینە، بەڵام لە شێعرەکانتدا شانازی بە سەروەریەکانی نەتەوەکەت بکە، پەندی پێشینان بهۆنەوەو خۆتیان پێ بڕازێنەوەو پەروەردەی خەڵکانی تریشی پێ بکە.[2]

٦ـ مەڵێ ماڵم لە (بەصرە)یە، بڵێ (بەصرە) لە ماڵم دایە:

گوتراوە: پیاوێك بە خاتری تەواوکردنو سەرگرتنی خانوەکەی داوا لە معاویە دەکات، دوانزە هار کاریتەی داری بداتێ، معاویە پێی دەڵێت: ماڵت لە کوێیە؟ وتی: لە (بەصرە)یە، وتی: ڕووبەرەکەی چەندە؟ وتی: دوو بە دوو فەرسەخە، وتی: مەڵێ ماڵم لە (بەصرە)یە، بەڵکو بڵێ (بەصرە) لە ماڵمدایە.[3]

٧ـ دەمزانی خواردنەکەی لێ دەبێ بە دەرد:

گوتراوە: پیاوێك بە خۆو بە کوڕێکەوە دەچێتە لای معاویە لەسەر سفرەی معاویە دانیشتن، منداڵەکەی بە پەلەپەل دەیخواردو معاویەش لێی دەڕوانی، باوکی دەیەویست ڕێی ئەم جۆرە خواردنەی لێ بگرێت، بەڵام منداڵ تێنەدەگەیشت، کاتێك ڕۆیشتن، باوکی سەرکۆنەی کردو بڕیاریدا جارێکی تر لەگەڵ خۆیدا نەیباتەوە، جارێکی تر کابرا دەچێتەوە

١ المصدر نفسه (٦/٢٥٤).

٢ تأريخ الطبري (٦/٢٥٤).

٣ البداية والنهاية (١١/٤٥٣).

لای معاویە، معاویە پێی دەڵێت: کوڕە شۆپ گەورەکەت کوا؟ وتی: سکی دێشێت، وتی: دەمزانی ئەم جۆرە خواردنەی لێ دەبێتە دەرد.[1]

**٨ـ تۆ چاوت لە مووی نێو پاروەکەمە؟:**

گێڕدراوەتەوە معاویە بە کابرایەتی دەشتەکی دەڵێت: ئەو مووە لە پارووەکەت دەر بکە، وتی: تۆ مووی نێو پارووەکەشم دەبینی؟ بە خوا جارێکی تر لەگەڵ تۆ نان ناخۆم.[2]

**٩ـ تۆ لەگەڵ عەبا نادوێی، ئەوەی لەنێو عەباکەدایە لەگەڵت دەدوێ:**

معاویە تەماشایکرد پیاوێك عەبایەکی شڕی لەبەردایەو قسەی لەگەڵ دەکات‌و بە چاوی کەمەوە بۆی ڕوانی، کابرا وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران خۆ تۆ قسە لەگەڵ عەبا ناکەی، ئەو کەسەی لەنێو عەباکەدایە قسەت لەگەڵدا دەکات.[3]

**١٠ـ هۆ کچی خۆم ئەوە ئەو شووەتە کە خودا بۆ تۆی حەڵاڵ کردووە:**

(عبدالله ی کوڕی عامر) هاوسەرگیری لەگەڵ (هیندی کچی معاویە) ئەنجامدا، لە شەوی بە زاوابوونی‌و لە کۆشکی (سەوز)دا، لێی نزیك بۆوەو ویستی کاری خۆی لەگەڵ بکات، بەڵام هیند بە توندی بەرپەرچی دایەوەو نەیهێشت، (عامر) لێیدا، (هیند) قیژاندی، کاتێك کەنیزەك‌و قەرەواشەکان گوێیان لە دەنگی بوو، وێکڕا قیژاندیان‌و دەنگیان بەرز بۆوە، (معاویە) بە دەنگیان بە ئاگا هات‌و هاتە لایان‌و وتی: هەواڵ چیە؟ وتیان: گوێمان لە قیژەی خانمی گەورەمان بوو و ئێمەش بە قیژە بۆمان ستاندەوە، چووە ژوورەوە، بینی هیند دەگریا، ڕووی کردە (عبدالله)و وتی: وای بۆ تۆ، چۆن لە شەوێکی ئاوادا بووك بەم شێوازە لێی دەدرێت؟ ئەمجا پێی گوت: لێرە مەمێنەو بڕۆ دەرەوە، ئیدی خۆی‌و (هیند) مانەوەو پێی وت: ئەی کچە شیرینەکەم ئەمە ئەو هاوسەرو هاوسەرینەتە کە خودا بۆتی حەڵاڵ کردووە، ئەی گوێت لە شیعری شاعیر نەبووە کە دەڵێت:

من الخضرات البيض أما حرامها   فصـــعب وأما حِلُّها فذلول

ئەمجا (معاویە) هاتە دەرەوەو بانگی (عبدالله)ی زاوای کردو پێی وت: بڕۆ ژوورەوە چاکم بۆ نەرم کردووی، ئیدی (عبدالله ی کوڕی عامر) چووە ژوورەوەو تەماشای کرد بووك خوڵقوخووی خۆش بووە، ئەمجا پێویستی خۆی لەگەڵ جێبەجێ کرد،[4] رحمهم الله تعالى.

---

١ البداية والنهاية (١١/٤٥٣).

٢ المنتخب والمختار (ص: ٥٥٩).

٣ البداية والنهاية (١١/٤٥٣).

٤ المصدر نفسه (١١/٤٦٤).

**١١ـ ئایا ڕاستە (معاویە) گوتبێتی: پیاوی بەخشندە بە کەیف‌و گوشادە؟**

لە (محمدی کوڕی عامر)ەوە، دەڵێت: معاویە سەبارەت بە (گۆرانی) سەرزەنشتی (عبداللە ی کوڕی جەعفەر)ی کرد، ڕۆژێك (عبداللە) بە خۆو بە (بودەیح)[١]ەوە دەچێتە لای (معاویە)، (معاویە) دانیشتبوو قاچێکی لەسەر قاچێکی دانابوو، (عبداللە) بە (بودەیح)ی گوت: هەهۆ (بودەیح)!، (بودەیح) دەستی بە گۆرانی کرد، (معاویە) قاچی بۆ دەلەراندەوە، (عبداللە) وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران وا مەکە، (معاویە) وتی: مرۆڤی بەخشندە شادومانە،[٢] ئەم ڕیوایەتە بەم جۆرە (البلاذري)[٣] هێناویەتی‌و (إبن عبد ربه)[٤]ش بە چەند زیادەیەکی نامۆوە گێڕاویەتیەوە[٥]، بێگومان ئەم ڕیوایەتە زەعیف‌و لاوازەو، بەم ڕیوایەتە (حەسەن)ە کە (الطبراني) لە ڕێی (کیسان)ی خزمەتچی (معاویە)وە گێڕاویەتیەوە بەرپەرچ دەدرێتەوەو پوچەڵ دەکرێتەوە، (کیسان) وتی: معاویە وتاری بۆ خەڵك داو وتی: ئەی خەڵکینە: پێغەمبەری خودا (ﷺ) ڕێگری لە نۆ شت کردووە، منیش ڕێگریتان لێ دەکەم ئەنجامیان بدەن: ((النوح، والشّعر، والتّبرج، والتصاوير، وجلود الاسباع، والغناء، والذهب، والحرير))[٦] واتە: لاواندنەوەی مردوو، شێعرو بەستە، ڕووت‌و قوتی، وێنەکێشان، کەوڵی درندان، گۆرانی، زێڕو ئاڵتوون، دامێن(زینا)و ئاوریشم. ئەو (خودا لێی ڕازی بێت) نەیدەهێشت خەڵك گوێ لە گۆرانی بگرن، هەر کەسێکیش پێیەوە ناسرابایە لە دژی ڕادەوەستا، (إبن الحکم) کاربەڕێوەبەری معاویە لە (مەدینە) بە توندی ڕووبەڕووی خەڵکی چاوەش‌و جرت‌و چەقەنەچی دەبۆوە، ئەمەو لە سەردەمی ویلایەتی ئەودا (مەدینە)یان بەجێ هێشت.[٧]

**١٢ـ دانەوەی قەرزەکانی خاتوو عائیشە (خودا لێی ڕازی بێت):**

معاویە (خودا لێی ڕازی بێت) گرنگی بە خاتوو عائیشە (خودا لێی ڕازی بێت) دەداو قەرزەکانی لە جیاتی دەدانەوە، (سەعیدی کوڕی عبدالعزیز) وتی: (معاویە) هەژدە هەزار

---

١ (بُدیح الملیح) خزمەتچی (عبداللە ی کوڕی جەعفەر) بوو.

٢ مرويات خلافة معاوية في تأريخ الطبري (ص: ٨٢).

٣ أنساب الأشراف (٤/٢٧)، مرويات خلافة معاوية (ص: ٨٢).

٤ العقد الفريد (٦/٢٢،٢١)، مرويات خلافة معاوية (ص: ٨٣).

٥ مرويات خلافة معاوية (ص: ٨٣).

٦ المعجم الكبير (١٩/٣٧٣)، إسناده حسن.

٧ الدولة والمجتمع في العصر الأموي.

دینار قەرزی لە جیاتی (عائیشە) دایەوە،[١] (عوروە) وتی: جارێك (معاویە) سەد هەزاری بۆ (عائیشە) نارد، وەڵڵاهی نەیهێشت ڕۆژئاوابێت تا هەر هەمووی نەبەشیەوە.[٢]

١٣ـ بایەخدان بە پێداویستیەکانی خەڵك:

معاویە (خودا لێی ڕازی بێت) دەترسا بە هۆی خۆحەشاردانی جاروبارەی لە موسڵمانان گوناهی بگاتێ‌و لێپێچینەوەی قیامەتی لەگەڵ بکرێت، کاتێك گوێی لەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) بوو: ((مَن ولاه الله شيئاً من أمر المسلمين، فاحتجب دون حاجتهم وخَلتهم وفقرهم، إحتجب الله دون حاجته وخلته وفقره يوم القيامة)) واتە: هەر کەسێك خودا بیکاتە سەرپەرشتیکاری شتێك لە کاروباری موسڵمانان‌و خۆی لە ئاقار جێبەجێکردنی پێداویستی‌و هەژاری‌و نەداریەکانیان وەشارێ، ئەوا لە دواڕۆژدا خودا لە ئاقار جێبەجێکردنی پێداویستی‌و هەژاری‌و نەداریەکانی ئەودا خۆی پەنها دەکات، جا معاویە لە پێناوی ئەوەدا هیچی لێ شاراوە نەبێت پیاوێکی بۆ پێڕاگەیاندنی پێداویستی‌و هەژاری‌و نەداریەکانی خەڵك تەرخانکرد،[٣] هەر جارێك والی (مەدینە) دەیەویست پۆستەچی بۆ لای معاویە بەرێ بکات، فەرمانی بە جارچی خۆی دەکرد: بانگ ڕاهێڵێ: هەر کەسێك پێویستیەکی هەیە، با نامە بۆ ئەمیری ئیمانداران بنووسێت.[٤]

١٤ـ کاریگەری مەرگی صاڵحان لەسەر معاویە (خودا لێی ڕازی بێت):

کاتێك (عتبەی کوڕی ئەبی سوفیان) کوڕێکی دەمرێت، خەڵکانێك بە مەبەستی سەرخۆشیکردن سەردانی معاویەیان کرد، معاویە وتی: مێردمنداڵێك لە خانەوادەی (ئەبی سوفیان) مردووە‌و خودا بۆ خۆی بردووەتەوە‌و موصیبەت نییە!، موصیبەتی گەورە (بە لای منەوە) مردنی (ئەبی موسلیمی خەولانی کریبی کوڕی سەیفی ئەنصاری)یە.[٥]

١٥ـ بایەخدان بە مزگەوت‌و کانیاوەکان:

(معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان) بایەخی بە (مسجد الحرام) داو فەرمانی بەرفراوانکردنی دا، تا شەوانە ڕووناك بێت‌و تەوافکەران بەرچاویان ڕوون بێت، لەسەر بودجەی (بيت المال) چراو لامپای بۆ دانان‌و (زەیت)یشی بۆ چراکان تەرخان کرد، بە هەمان شێوە گرنگی بە مزگەوتی (ئەقصا) دا، هەروەها لە ساڵی ٥٣ی کۆچیدا (مسلمەی کوڕی مخلد)ی

---

١ سير أعلام النبلاء (٣/١٥٤).

٢ المصدر نفسه (٣/١٥٤).

٣ الدولة الأموية حمدي شاهين (ص: ٢٧٣)، نقلا عن البداية والنهاية.

٤ تأريخ الطبري (٦/٢٥٤).

٥ تأريخ دمشق (١/٢٢٧)، نقلا عن أثر العلماء في الحياة السياسية في الدولة الأموية (ص: ٥٣).

کاربەڕێوەبەری (مصر)ی مزگەوتی گەورەی لە (الفسطاط) گەورەتر کردو دیوارەکانی گەچکردن‌و، زەخرەفەکاری تێدا ئەنجام داو چوار (منارە)ی بەرزی بۆ دروست کردو (حەصیر)ی لە نێودا ڕاخست، خەڵکی (مصر)ی وادارکرد (منارە) بۆ مزگەوتەکان دروست بکەن‌و فەرمانی بە بانگدەرەکان کرد کە دەبێ بانگدانی شەوانەیان لە یەك کاتدا بێت.[١]

(موغیرەی کوڕی شوعبە) ڕووبەری مزگەوتی گەورەی (کوفە)ی بەرفراوان کردو پاش ئەویش (زیاد بن أبیە) بە گەورەی‌و ڕێکوپێکی نۆژەنی کردەوەو تەختەبەردی لە نێوەکەیدا ڕاخستن، دەیگوت: لە دروستکردنی هەر یەکێك لە پایەکانیدا (١٨٠٠) هەزارو هەشت سەد درهەمم خەرج کردووە، هەورەبانێکیشی بە سەرەوە دروست کردو (خالدی کوڕی عبدالله ی قەسری) لە سەردەمی ویلایەتی خۆیدا نوێی کردەوە، ئەمجا (عبدالله کوڕی زیاد) مزگەوتەکەی زیاتر گەورە کردو نێوەکەشی بەردڕێژ کرد.[٢]

هەروەها (زیاد بن أبیە) مزگەوتی گەورەی (بەصرە)ی گەورەو بەرفراوان کردو دیوارەکانی بە خشتەی سوورەوەکراوە (ئاجور)و گەچ هەڵچنین‌و ژمارەیەك پایەشی تێدا دروستکردن‌و سەرەکەی بە (ساج) گرت‌و (منارە)کەشی بە بەرد بەرزکردەوە، جگە لەمەش مزگەوتی زۆری لە (بەصرە) دروستکردن، ئەمجا (عبدالله)ی کوڕی مزگەوتی گەورەی بە شێوەیەکی گەورەترو بەرفراوانتر نۆژەن کردەوە،[٣] ئەمەو معاویە بایەخی بە مەڵبەندە گشتیەکانی دەوڵەتی ئیسلامی داو کاری بۆ زۆربوونی ئاوی خواردنەوەی شاری (مەدینە) کردو لەنێو حەرەمی (مەککە)شدا جۆگای بۆ چەند کانیاوێك هەڵبەست‌و[٤] بیرە ئاوی زۆریشی لەسەر ڕێگاوبانەکان لێدان‌و هەرێمەکانی مەملەکەتەکەی بە شێوەیەکی قایم‌و توندوتۆڵ پێکەوە بەستنەوە.[٥]

١٦ـ پێشبڕکێی ئەسپسواری لە سەردەمی معاویەدا (خودا لێی ڕازی بێت):

معاویە (خودا لێی ڕازی بێت) بە یەکەمین خەلیفە دادەنرێت کە پایەکانی کلتوری پێشبڕکێی ئەسپسواری لە مێژووی ئیسلامەکەماندا دامەزراندبن، بە چەشنێك پێشبڕکێی ئەسپسواری لە (دیمەشق) دا ئەنجام دەدراو، ژمارەیەك لە ئەسپسوارانی تەواوی گۆشەو کەنارەکانی دەوڵەتی ئیسلام بەشدارییان تێدا دەکرد، ئەوانە دەچوونە نێو ڕەوە ئەسپەوەو

---

١ دراسة في تأريخ الخلفاء الأمويين (ص: ٣٤٧).

٢ المصدر نفسه (ص: ٣٤٧)، فتوح البلدان (ص: ٣٩٩، ٣٤٠).

٣ فتوح البلدان (ص: ٤٢٦، ٤٢٧)، دراسة في تأريخ الخلفاء الأمويين (ص: ٣٤٨).

٤ أخبار مكة (٢/٢٢٧) الأزرقي. دراسة في تأريخ الخلفاء الأمويين (ص: ٣٤١).

٥ الخلافة الأموية، عبدالمنعم الهاشمي (ص: ٢٥).

بە هۆنراوە شانازییان بە خۆیانو ئەسپەکانیانەوە دەکرد، لە کۆتایی کێبەڕکێکەدا دیاری بە نرخو گرانبەها لە لایەن (خەلیفە)وە پێشکەش بە براوەکان دەکرا.[١]

١٧ـ پێشکەشکردنی خواردن بە حاجیو ڕۆژوگران:

معاویەی ئەمیری ئیمانداران (خودا لێی ڕازی بێت) لە (مەککە)دا میوانخانەیەکی گەورەی وەقفی بۆ حاجیو زیارەتکاران دروستکردو لەوێدا خواردن بۆ حاجیانو ڕۆژوگرانی هەژاری مانگی ڕەمەزانی موبارەك سازدەکرا.[٢]

١٨ـ خودا چاکتر بە تۆ دەوێرێت:

معاویە چاوی لە (یەزید)ی کوڕی بوو لە خزمەتچییەکی خۆی دەدا، پێی وت: بزانە خودا دەسەڵاتی بەسەر تۆدا زیاترە، شورەییە بۆ تۆ! ! چۆن لە کەسێك دەدەی بەرگری پێ لە خۆی ناکرێت؟ قەسەم بە خودا دەسەڵاتم ڕێی یێ گرتووم تۆڵە لە داخ لە دڵانی خۆم بکەمەوە، چاکترین کەس کەسێکە لە کاتی دەسەڵاتدا چاوپۆشی دەنوێنێت،[٣] ئەمە ئامۆژگارییەکی جوانو ڕێکوپێك بوو لە لایەن (معاویە)ی ئەمیری ئیمانداران (خودا لێی ڕازی بێت) بۆ (یەزید)ی کوڕی تا خۆی بەم ڕەوشتە ڕەندە: (لێبوردن لە کاتی دەست ڕۆیشتن) برازێنێتەوە، ئەم سیفەتە بە یەکێك لە گرنگترین ڕەگەزەکانی جوامێریو سەروەرایەتیکردنی ئوممەت دادەنرێت، ئەو پێشەکی دەسەڵاتی خودای گەورەو باڵادەستی بە بیرخستەوە، تا بەڵکو لە پلەی خۆبەزلزانی دابەزێتو لە ئاقار ئەو ڕەشەخەڵکەی لەبەر دەستی دایە ترسو خۆفی خودای ڕێ بنێشێت.[٤]

## دووەم: بایەخدانە زانستیەکان:

معاویە (خودا لێی ڕازی بێت) هانی کاروبەڕێوەبەرو زاناو ڕۆڵەکانی ئوممەتی دەدا ڕاپەڕینێکی ڕۆشنبیری شارستانی بێننە ئاراوە، سەردەمی ئەو ڕاپەڕینێکی گەورەی لە زانستەکانی (قورئانو تەفسیرو فیقهو عەقیدە)وە بە خۆوە بینیو ئەستێرەی زۆرێك لە زانایانی ئەو ئوممەتە لە ئاسمانی سەردەمی ئەودا هەڵاتنو تا دنیا دنیایە موسڵمانان وتەو ڕاو ئیجتیهادەکانیان بە بەڵگە دەهێننەوە، (إبن عباس، ئەبو هورەیرە، إبن عمر، دەیان زانای تریش) موفەسیرو موحەدیثو فەقیهی هەڵکەوتووی ئەو سەردەمە بوون، زانستی

---

١ التربية والثقافة العربية الإسلامية في الشام والجزيرة خلال القرون الثلاثة الأولى للهجرة بالإستناد الى مخطوط تأريخ مدينة دمشق لإبن عساكر (ص: ٩٤)، الرفق بالحيوان، د. سلامة الهرفي (ص: ٤٩).

٢ التطور الإقتصادي في العصر الأموي (ص: ٢٦).

٣ البداية والنهاية، نقلا عن التأريخ الإسلامي (٢٣/١٧).

٤ التأريخ الإسلامي (٢٤/١٧).

سەرەکی بریتی بوو لە: (قورئانی پیرۆز، سوننەتی نەبەوی، زمانی عەرەبی)، بێ لەم زانستانە، (معاویە) بایەخی بە چەند زانستی تریش دا، وەکو:

١ـ (معاویە)و بایەخدانی بە مێژوو: معاویە (خودا لێی ڕازی بێت) یەکەم سەرۆك بوو کاری بۆ نووسینەوەی (مێژووی گشتی) کرد بە زمانی عەرەبی، بەو واتایەی ئەم مێژووە تەنها لە نووسینەوەی (غەزاکانی پێغەمبەر (ﷺ)و، بەسەرهاتی پێغەمبەرانو، ڕەچەڵەكو بنەچەکەی هۆزەکانو، ڕۆژگاری عەرەب) کورت هەڵنەهاتبێت، بەڵکو بریتی بێ لە مێژووی ئۆممەتەکانی پێشینو، ژیاننامەی پاشاکانو جەنگو ڕووداوو فێڵە جەنگییەکانو جۆرەکانی سیاسەتو هەموو ئەو شتانەی بشێن دەسەڵاتداران بیانخوێننەوە،[1] ئەو لە سێ بەشی شەو بەشێکی دەخەوت، ئەمجا ڕادەبووو ئەو دەفتەرو نوسراوانەی دەهێنانە خوارەوە کە پەیوەندیان بە مێژوونامەی شاکانو جەنگو فێڵەکانیانەوە هەبوو، چەند خزمەتچیەکی خوێندەواری ڕاگرتبوونو چاکخوێندنەوەو دەرخکردنی ئەو دەفتەرە خەتیانەی پێ سپاردبوونو، ئیدی هەر شەوێك ڕادەبورد گوێبیستی چەند ڕستەڕووداو یان جۆرە سیاسەتێکی دێرین دەبوو.[2]

(عبیدەی کوڕی شریة) یەکێك بوو لە مێژووزانە بەناوبانگەکانی وڵاتی (یەمەن)، (معاویە) بانگهێشتی کرد بۆ (دیمەشق)، سەبارەت بە مێژووی پێشینانو شاکانی (عەرەبو عەجەم) پرسیاری ئاراستە دەکردن، (معاویە) فەرمانی بە کاتیبەکانی کرد هەرچی (عبیدة) سەبارەت بە (پەندی پێشینان)و (پاشا پێشینەکان) دەیڵێ بۆی بنووسنەوە.[3] ئیدی (عوبەیدە) تاکە زانایەك نەبوو (معاویە) لەم بوارەد بە تەنیا پشت بە ئەو ببەستێتو گێڕانەوەکانی لە چەند پەڕاوێکدا بنووسێتەوە، بەڵکو زۆرێك لە حیکایەتخوانو شارەزا لە مێژووی نەتەوە فەوتاوەکانو هۆزە عەرەبەکانی کۆن بە وەفد دەهاتنە لای (معاویە).[4]

بێگومان خەڵکانی سیاسەتمەدارو حوکمگێڕو مەلیكو سەرۆکەکان لە میانەی بایەخدانیان بە مێژووی پێشینان پەندی گەورە وەردەگرنو فێری وانەی بەجگار گرنگ دەبن، سیاسەتمەدارێك کە لە ڕەوڕەوەی مێژوو ڕێو شوێنەکانی شارەزایە لە گۆڕەپانی چالاکیەکانیدا سەرکەوتنی زیاترو چاکتر بەدەست دێنێت لەوانەی لەم بوارەدا کڵۆڵن، لێرەدا پەیوەندیەکی توندو تۆڵ لە نێوان مێژووو سیاسەتدا هەیە.

---

١ الدولة الأموية، حمدي شاهين (ص: ٤٥٤)، التأريخ العربي (٩٥/١).

٢ مروج الذهب (٤١/٢)، الدولة الأموية، شاهين (ص: ٤٥٥).

٣ الدولة الأموية، حمدي شاهين (ص: ٤٥٤)، التعليم في العصر الأموي (ص: ١١٧).

٤ التأريخ العربي (١٩٥/١)، الدولة الأموية، حمدي شاهين (ص: ٤٥٥).

٢ـ (معاویە)و گرنگیدانی بە شێعرو زمان:

معاویە (خودا لێی ڕازی بێت) دەرکی بە گرنگی شیعر دەکردو چێژی لێ وەردەگرتو بایەخی ئەوی لە بواری ڕاگەیاندن‌و پڕوپاگەندەی سیاسی دەوڵەتەکەیدا فەرامۆش نەکردبوو، گرنگی بە پەروەردەکردنی ئەدەبیانەی ڕۆڵەو برازاکانی دەداو، هەوڵی دەدا فێری شێعر ببن‌و بزانن چۆن تام‌و چێژی لێ وەردەگرن، نامەی بۆ (زیاد) نووسی‌و پێی وت: کوڕەکەتم بۆ لا بنێرە، کاتێك گەیشتەجێ، پرسیاری هەر شتێکی لێکرد دەستبەجێ وەڵامی دایەوە، تا سەبارەت بە (شیعر) پرسیاری لێکرد، هیچی دەربارە نەزانی، جا پێی وت: چ شتێك ڕێگر بووە فێری (شێعر) ببی؟!، وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران من حەزم نەکرد لە سنگی خۆمدا وتاری خودای (ڕەحمان)و وتاری (شەیتان) پێکەوە کۆ بکەمەوە، (معاویە) وتی: ونبە لەبەر چاوم، قەسەم بە خودا ئەگەر لە جەنگی (صفین)دا ئەم شێعرەی (إبن الإطنابة) کاری تێنەکردبامایە هەڵدەهاتم:

أبت لي عفتـــي وأبى بلائي وأخذي الحمد بالثمن الربيح
وإعطائي على الإعدام مالي وإقدامي على البطل المشيح
وقولي كلما جشأت وجاشت مكانك تحمدي أو تستريحي[١]

ئەمجا لە نامەیەکدا کە ئاڕاستەی (زیاد)ی باوکی کرد، فەرمانی پێدا: شیعری بۆ وەخوێنێت، تا کار بەوە گەیشت شیعری دەرخ دەکردن‌و دێڕێکیشی لێ فەرامۆش نەدەکردن،[٢] معاویە (خودا لێی ڕازی بێت) بە زۆری ئەم بەیتە شیعرە پەندئامێزانەی دەخوێندنەوە:

فما قتـــل السفاهة مثل حلمٍ يعود به على الجهل الحليم
فلا تسفـــه وإن مُلِّئت غيظاً على أحد فإن الفُحش لوم
ولا تقطـــع أخاً لك عند ذنبٍ فإن الذنب يغفره الكريم[٣]

معاویە بە جۆرێك بایەخی بە شیعرەدا تا ئەوەی دەرخی دەکرد، ڕۆژێك (إبن أبي محجن الثقفي) دەچێتە مەجلیسی معاویەو دادەنیشێت، معاویە پێی دەڵێت: باوکی تۆ ئەو کەسەیە کە دەڵێت:

إذا مت فادفني إلى جنب كَرْمَةٍ تُرَوِّي عظامي بعد موتي عُرُوقُها
ولا تدفنَنِّي بالفـــلاة فـــإنني أخاف إذا مـا مِتُّ أن لا أذوقها

---

١ البداية والنهاية (٤٢٦/١١).

٢ الدولة الأموية المفترى عليها (ص: ٤٥٧).

٣ البداية والنهاية (٤٢٢/١١).

(إبن أبي محجن) وتی: ئەگەر حەزت لێیە شیعری لەمە خۆشتری ئەوت بۆ دەخوێنمەوە، وتی: کامەیە؟ وتی: دەڵێت:

لا تسأل النـاس: مالي وكثـرته | وسائل القوم ما حزمي وما خلقي
القوم أعلـم أني مـن سـراتهم | إذا تطيـش يـد الرِّعد يده الفَرِق
قد أركب الهول مسد ولا عساكره | وأكتـم السِّر فيـه ضربة العنق

هەر ئەو دەڵێت:

إن يكـن وليّ الأمـير فقـد | طـاب منـه النجلُ والأثر
فيـكـم مستيقـظ فَهِـفٌ | قُلقُـلانٌ حيًّـة ذكـر
أحمـد الله إليـك فمـا | وصلـة إلا ستنبـتر[1]

(مسكين الدارمي)ی شاعیر یەکێك بوو لە کەسە نزیکەکانی (معاویە)و (یەزید)ی کوڕی، (معاویە) سەبارەت بە ئەو لە (عطارد کوڕی حاجب)ی پرسی‌و گوتی: گەنجە بیچمگەش‌و زمانتەڕە (دارمی)یەکە چۆنە؟ ـ مەبەستی پێ لە (مسکین) بوو، وتی: باشە، ئەی ئەمیری ئیمانداران، وتی: پێی ڕاگەیەنە کە من پایەم بەرز کردۆتەوەو موچەم بۆ بڕیوەتەوە، ئێستا ئەو لە وڵاتی خۆی دەژیا، ئەگەر حەزی لێیە با هەر لەوێ بێت، ئەگەر حەزیش دەکات با بێتە لامان، با بە ئارەزووی خۆی بکات، لەمەولا خەڵاتەکەی ئێمەی پێ دەگات، موژدەی پێ بدە: کە موچەم بۆ چوار هەزار کەسی هۆزەکەی ئەو (خیندەف) بڕیوەتەوە،[2] (مسکین) بەم شێوازە دەربارەی معاویە دەڵێت:

إليك أمـير المؤمنـين رحلتهـا | تثـير القطا ليلاً وهـن هجود
على الطائر الميمون والجد صاعد | لكـل أنـاس طائر وجدود
إذا المنبر الغربـي خلّي مكـانـه | فـإن أمـير المؤمنـين يزيد[3]

گوتراوە: کە معاویە داوای لە (مسکین الدارمی) کردووە هۆنراوەیەك سەبارەت بە بەیعەتدان بە (یەزید) بهۆنێتەوە، پاش هۆنینەوەی هۆنراوەکە بە ئامادەبوونی کەسە دیارەکانی (بەنی ئومەییە)و پیاوماقوڵان‌و دەستڕۆیشتوانی نێو خەڵك خوێندیەوە، کەس لە ئامادەبووان نارەزایی دەرنەبڕی‌و بەبێ دەنگی دانیان بە بەیعەتەکەدا هێنا‌و لەسەری ڕێکەوتن، ئەمجا معاویەو یەزید سەرو خەڵاتی شایستەیان پێشکەش کرد.[4]

---

١ الشعر والشعراء، لإبن قتيبة (١/٤٢٤).
٢ تأريخ دمشق (٣٩/٢٠، ٤٠).
٣ الشعر والشعراء، لإبن قتيبة (١/٥٤٤).
٤ الأغاني للأصفعاني، نقلا عن الحياة العلمية في العراق (ص: ١١٠).

ئەمەو (مسكين الدارمي) لە ڕیزی پێشەوەی شاعیرەکانی سەردەمی معاویە دێتە هەژمارو هۆنراوەگەلێکی جوان‌و ڕێکوپێکی لە دوا بەجێماون، لەو هۆنراوانە:

وإذا الفـاحش لاقى فـاحشاً فهناكم وافق الشـن الطبق
إنما الفُحشُ ومـن يعتـاده كغُراب السّوءِ مـاشاءَ نعق
أو حمار السوء إن أشبعتـه رمـح الناس وإن جاعَ نهق
أو غلام السـوء إن جوعتـه سرق الجار وإن يُشبع فسق
أو كغَيري رَفَعَـت من ذيلها ثـم أرخَتـه ضراراً فامَّزق
أيها السائل عن من قد مضى هل جديد مثل ملبوس خَلَق[1]

هەروەها دەڵێت:

نـاري ونـار الجـار واحدة وإليـه قبلي تُنَزل القِـدْر
مـا ضرَّ جـاراً لي أجـاوِرُهُ ألا يكـون لبـابه سـترُ
أعمـى إذا مـا جارتي برزت حتى يغيـب جارتي الخدر[2]

معاویە (خودا لێی ڕازی بێت) ڕقی لە قسەی ئاوازدار دەبۆوە، جارێك (زیاد بن أبیه)ی والی عێراق (عبیدالله)ی کوڕی بۆ لای (معاویه) دەنێرێت، (عبیدالله) قسەکانی بە ئاوازو مەکرەوە دەکات، معاویه بۆ زیادی نووسی: کوڕەکەت چۆنت وەصف کردووە هەر وایە بەڵام زمانی ڕاست بکەوە.[3] کاتێك کابرایەك‌و براکەی هاتنە لای (زیاد)و شکاتیان لە براکەیان کردو کابرا وتی: کاتێك باوکمان مرد، براکەمان دەستی بەسەر ماڵی باوکماندا گرت‌و خواردی، زیاد زمانی تێکەڵ‌و پێکەڵ بوو وتی: ئەوەی دەربارەی زارو زمانت لە دەستت داوە، زیانی زیاتری لێ داوی لەوەی لە ماڵ‌و سامانت لە دەستت داوە.[4]

لە سەردەمی معاویەدا زۆرێك لە زانایانی زانستی (النحو) لە شاری (بەصرە) دەرکەوتن، (أبو الاسود الدؤلي) یەکەم کەس بوو بناغەی (النحو)ی دامەزراندو ڕێزمانی عەرەبی داناو ڕێزەوە (سەمعی‌و قیاسی)یەکانی بۆ کێشان، ئیدی کەسە دیارو ماقوڵەکانی نێو خەڵك بە ئاواز قسەیان دەکردن، (باب)ەکانی: (الفاعل، المفعول بە، المضاف، حرف الجر والرفع

---

١ الشعر والشعراء (٥٤٤/١).
٢ الشعر والشعراء (٥٤٥/١).
٣ البيان والتبين (٢١٠/٢)، الحياة العلمية في العراق.
٤ البيان والتبين (٢٢٢/٢).

والنصب والجزم)ی دانان،[١] كتێبێكی لەسەر (النحو)[٢] داناو وێڕای ئەمەش شاعیر بوو، لە بەناوبانگترین شیعرەكانی:

یاأیها الرجل المعلم غیره    هلا لنفسك كان ذا التعلیم؟
تصف الدواء لذي السقام    وذي الظنا كما یصح به وأنت سقیم
ونراك تصلح بالرشاد عقولنا    أبداً وأنت من الرشاد عدیم
إبدأ بنفسك فانهها عن غیّها    فإذا إنتهت عنه، فأنت حكیم
فهناك یسمع ما تقول ویهتدي    بالقول منك وینفع التعلیم
لاتنه عن خلق وتأتي مثله    عارٌ علیك إذا فعلت عظیم[٣]

سەبارەت بە (دنیانەویستی)یەك كە لە تەواكولو پاڵدانەوە بەریە دەڵێت:

وإذا طلبت من الحوائج حاجة    فادع الإله وأحسن الأعمالا
فلیعطینك ما أراد بقدرة    فهو اللطیف لما أراد فعالاً
ودعِ العباد وشأنهم وأمورهم    بید الإله یقلب الأحوالا[٤]

٣ـ (معاویه)و بایەخدانی بە زانستە ئەزمونیەكان:

دوابەدوای ڕوخانی دەوڵەتەكانیان دەوڵەتی (ئومەوی) بوو بە میراتگری خەزنەی زانیاری (فارس)و (ڕۆم)ی عەجەم، ئەم كلتورە پاش دەستاودەستپێكرانی لە نێوان توێژەرو تێكدەرە (یۆنانیزانو سریانیزانانی)یەكانی دوێنیەوەو وەك كەلەپورێكی سادەو شێوێنراوی لێ هاتووەو، ئیمڕۆ كەوتۆتە بەردەستی (ئیسلام)و ئەوا پێویستە سودی لێ ببینرێتو وەربگێڕدرێتە سەر زمانی عەرەبی،[٥] هەندێك لەو وەرگێڕدراوانە گرنگیان بە لێكۆڵینەوەی زانستە ئەزموونیەكان دەدا، جاروبارێش هەندێك لە وەرگێڕدراوەكان بە پێچەوانەی ئەمەوە بوون، وەكو زانراوە هەموو ئەمانە پێویستیان بە هەوڵو تەقالاو توانایەكی هێند زۆرو گەورە هەیە كە خەڵكانی سادە بڕستیان پێ ناشكێتو لەبەر ئەمە (ئومەوی)یەكان پاڵپشتی ئەم كارەیان كردو كار بەوە گەیشت كاری گەورەو بەرهەمدار لەم ڕێیەدا ئەنجام دران، (بە ئیزنی خودا لەمەولا باسی لێوە دەكەین)، ئەم پرۆسە لەسەردەمی معاویەوە دەستی پێكرد، ئەو لە پێش هەموو كەسەوە گرنگی بەم زانستانە داو چاودێری زانایانی دەكردو (خانەیەكی

---

١ طبقات النحويين (ص: ٢١)، الزبيدي، الحياة العلمية في العراق (ص: ١٠٤).
٢ الشعر والشعراء (٧٢٩/٢).
٣ الأدب الإسلامي وتأريخه (١٧/٢)، عاد الهاشمي.
٤ المصدر نفسه (١٧/٢)، ديوان أبي الأسود الدؤلي.
٥ تأريخ سوريا، فيليب حتى (١٣٢/١)، الدولة الأموية، شاهين (ص: ٤٥٩).

حیکمەت) واتە: مەڵبەندێکی بۆ کتێب‌و توێژینەوە دامەزراند، دوابەدوای سوفیانیەکانیش، مەڕوانیەکان بایەخیان بەم (خانەی حیکمەت)ە دەداو لە کاتی سەفەرو جەنگ‌و هەراکانیشدا فەرامۆشیان نەدەکرد.[١]

چەند مێژوونووسێك ئاماژە بە ڕۆڵی (إبن أثال)ی نەصرانیی پزیشکی معاویە دەدەن، لە گواستنەوەی هەندێك لە زانستە پزیشکیەکان بۆ سەر زمانی عەرەبی‌و،[٢] بە چەشنێك: سەرەتای هەوڵە جیدیەکان بۆ وەرگێڕان، لەگەڵ (خالیدی کوڕی یەزید) دەستی پێکرد، چونکە ئەو یەکەمین کەس بوو گرنگی بە وەرگێڕانی زانستی کیمیا دا بۆ سەر زمانی عەرەبی‌و فەرمانی بە سازکردنی دەستە مامۆستایەکی یۆنانیی قوتابخانەی (ئەسکەندەریە)ی (مصر) کرد، ئەمانە کە لە زمانی (عەرەبی)یشدا شارەزابوون، (خالید) داوای لێکردن ژمارەیەك لەو کتێبانەی لەبەر دەستیاندان لە زمانی (یۆنانی‌و قیبطی)یەوە وەرگێڕنە سەر زمانی عەرەبی، ئەمە لە مێژووی ئیسلامدا یەکەمین کاری وەرگێڕان بوو.[٣] بە هەمان شێوەو لە بواری پزیشکیدا داوای لێکردن کتێبەکانی (جالینۆس) وەرگێڕان، بەم چەشنە بناغەی بۆ زانستەکانی نوشداری داڕشت‌و یەکەمین کەس بوو مزەی بە وەرگێڕان‌و فەیلەسوفانداو، خۆی لە زانایان‌و پسپۆڕان‌و سەردەستەی زانستە پیشەییەکان نزیك کردەوەو، لە هەموو بوارەکانی ئەستێرەناسی‌و پزیشکی‌و کیمیاو جەنگ‌و ئامرازو زانستە پیشەسازیەکاندا کتێبی بۆ وەرگێڕدران، کتێبگەلێکی زۆری بۆ کۆکرانەوەو خستنیە نێو (خەزێنەی ئیسلام)ەوەو بەم جۆرە یەکەمین (کتێبخانە) لە (دیمەشق)ی پایتەختی جیهانی ئیسلامدا دامەزرێنرا.[٤] نیشانەگەلێکی زۆروزەوەند ئاماژە دەدەن کە لە سەردەمی (معاویە)دا ژمارەیەکی زۆر لە خەڵك خۆیان بە زانستی پزیشکیەوە سەرگەرم کردووە، بە جۆرێك هەر (٥٣٤) پێنج سەدو سی‌و چوار کەسێك پزیشکێکی بەر کەوتووە، ئەم ڕێژەگیریە لەم ڕیوایەتەی (إبن کثیر)ەوە وەرگیراوە، کە کاتێك (زیاد بن أبیە)ی والی (بەصرە) دەستی بە نەشتەر بریندار کرا، (١٥٠) سەدو پەنجا پزیشك ئامادەی دەرمانکردنی بوون،[٥] لەو دەمەدا ژمارەی دانیشتوانی (بەصرە) نزیکەی (٨٠) هەشتا هەزار کەس دەبوو.[٦]

---

١ الدولة الأموية، يوسف العش (ص: ٣٤٨).

٢ عيون الأبناء في الطبقات ألأطباء (ص: ١٧١٧)، إبن أبي صبيعة.

٣ الدولة الأموية، حمدي شاهين (ص: ٤٦٠).

٤ خطط الشام (٢٣/٤، ٢٤)، الدولة الأموية، حمدي شاهين (ص: ٤٦٠).

٥ البداية والنهاية (٣٦١/١١).

٦ التطور الإقتصادي في العصر الأموي (ص: ٢٥٥).

# باسی چوارەم

## ( خەواریج ) لە سەردەمی ( معاویە )دا

ئەم گروهە پاش ئەنجامدانی پرۆسەی (تەحکیم)ی جەنگەکەی (صفین) بەم ناوەوە ناسێنران، بەر لەمە توندو تیژترین پشتیوانی (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) (خودا لێی ڕازی بێت) بوون‌و لە هەردووك جەنگی (جەمەل‌و صفین)دا بە پشتیەوە بوون، بەڵام پاشان بە (تەحکیم) قایل نەبوون‌و لێی جیابوونەوە، هەوڵیدا قەناعەتیان پێ بکات‌و بیانهێنێتەوە نێو کۆمەڵ، بەڵام لەسەر هەڵوێستی خۆیان سووربوون‌و زێدەڕۆیی زۆریان لە جیابوونەوەکەیاندا کردو، کار بەوەگەیشت خراپەیان لەسەر زەویدا بەرپاکردو، بە هۆی ئەمەوە (عەلی)یان ناچار کرد هێزیان لە دژ بەکاربێنێت‌و، جەنگی دەستەویەخەیان لەگەڵ بکات‌و زۆربەیان لە جەنگی (نەهرەوان)دا لەنێوبەرێت.

ئەوان بە هۆی یاخی بوونیان لە (ئیمام)و دەرچوونیان لە بازنەی جەماعەتی موسڵمانان ناوی (خەواریج)یان بەسەر دابڕا، هەڵبەتە بۆ خۆیان پێی ڕازی نەبوون‌و بە حیسابی ئەوە لە بەرانبەر (بەهەشت)دا خۆیان بە خودا فرۆشتووە ناوی (شوڕات)یان لەخۆنابوو دڵی خۆیان بەم ئایەتە موژدەبەخشە دەدایەوە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَ﴾[1] واتە: لە ڕاستیدا خودا لە بەرانبەر پێدانی (بەهەشت)دا گیان‌و سامانی لە ئیمانداران کڕیوە، زیاد لەمەش بە خاتری ئەوە دەیانگوت: (لا حكم إلا لله)= حوکمدان بەس بە دەست خودایە، (الحكمة)شیان پێ دەگوتراو، بە حوکمی ئەوە لە نزیك گوندی (الحروراء)ی دەوروبەری (کوفە) لە (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) (خودا لێی ڕازی بێت) جیابوونەوە، (الحرورية)شیان پێ دەگوترا.[2] ئەوان بە هۆی ئەوە (عەلی) بە (تەحکیم)ەکەی نێوان خۆی‌و معاویە (خودا لێیان ڕازی بێت) قایل بوو، لە دژی ئەو ڕاست بوونەوەو بیروبۆچوونی خۆیان لە مەڕ (خیلافەت) لەسەر دوو بنەمای گشتی دامەزراندو بە هۆیەوە گروهە بێ سەروبەرەکانیان یەکیان گرت.[3]

---

١ التوبة (١١١).

٢ العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ٤٥٤).

٣ النظريات السياسية الاسلامية، محمد ضياء (ص: ٥٧).

بنەمای یەکەم: بە پێچەوانەی بۆچوونی ئەهلی (سوننەت) پێیان وایە پۆستی (خیلافەت) لەسەر هۆزی (قورەیش) وەقف نەکراوە،[1] بەڵکو هەر موسڵمانێك ئەگەر (کۆیلەیەکی قولەڕەشی حەبەشی)یش بێت‌و شیاوی خۆی بسەلمێنێت دروستە وەری بگرێت‌و واجبە (خەلیفە) لە لایەن موسڵمانانەوە دیاری بکرێت‌و ئەگەر دیاریکراو دانرا بۆی نیە سازشی لەسەر بکات، یان (تەحکیم) قبوڵ بکات، ئیدی بە گوێرەی ئەم (بنەمایە)یان دان بە خیلافەتی (أبوبکرو عمر)دا دەهێنن‌و، سەبارەت بە (عوسمان)یش دان بە بەشی یەکەمی خیلافەتەکەیدا دێنن‌و لە قۆناغی دووەمیشداو تا کۆتایی ژیانی بە کافری دادەنێن، دەربارەی (عەلی)یش تا قبوڵکردنی تەحکیم. دان بە خیلافەتەکەیدا دێنن‌و دوای ئەمە نەك هەر دانی پێداناهێنن بەڵکو بە کافریشی دادەنێن.[2] بە هەمان شێوە دانیان بە خیلافەتی (معاویە)و (بەنی ئومەییە)دا نەهێناوەو[3] بە کافریان داناون، هەر بەم جۆرە (عائیشەو طلحةو زوبێرو عمری کوڕی عاص‌و أبا موسای ئەشعەری)یان بە کافر هەژماردوون، بە شێوەیەکی گشتی هەر موسڵمانێك لەسەر مەزەبی ئەوان نەبوبێت بە کافریان داناوەو شوێنی نیشتەجێ بوونی ئەوانیان بە نیشتیمانی کوفر(دار الكفر) حیساب کردووەو، ماڵ‌و خوێنیان‌و کوشتنی منداڵەکانیشیان حەڵاڵ کردوون.[4]

بنەمای دووەم: دەرچوون لە دژی ئیمام‌و سەرۆکی ستەمکار واجبە،[5] لێرەوە بیچمی سامناکی بزوتنەوەکەیان دەردەکەوێت، خۆ ئەگەر ناکۆکیەکەیان لەسەر بۆچوون‌و بیروڕاکانیان‌و مشتومڕو بەڵگەهێنانەوەو پێسەلماندن کورت هەڵێنابایە، کارەکە ئاسان دەبوو، بەڵام ئەوان شمشێریان لە دژی نەیارەکانیان لە کالان دەرکێشاو، سەرەتا لە دژی (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) (خودا لێی ڕازی بێت) ڕاوەستان‌و دەیانویست بە هێزو زەبروزەنگ بیروبۆچوونەکانیان بسەپێنن، ئیدی چۆن لە بۆچوونەکانیاندا زێدەڕۆییان کرد، بە هەمان جۆر توشی زیادەڕۆیی بوون‌و پەنایان بۆ بەکارهێنانی هێزو زەبروزەنگ‌و توندوتیژی بردو، بەمە زیانێکی گەورەیان لە خۆیان‌و (ئوممەت) داو کەشوهەوای ساف‌و بێگەردی دەوڵەتی

---

١ الدولة الأموية في المشرق، محمد النجار (ص: ٨٧).

٢ مقالات الاسلاميين (١٥٦/١، ١٨٩).

٣ الدولة الأموية في المشرق (ص: ٨٧).

٤ مقالات الاسلاميين (١٥٩/١، ١٨٩).

٥ النظريات السياسية الاسلامية (ص: ٥٧).

(ئومەوی)یان تەپوتۆزاوی کرد، ئەوان سەرسەختترین دوژمنـی دەوڵـەتی نـاوبراو بـوون،[١] لـە کتێبـی (أسمـی المطالـب في سـیرة أمـیر المـؤمنین علـی بـن أبـي طالـب)دا بـە درێـژی باسـی پەیڕەووبەرنامەی (خەواریج)م کردووە.[٢]

گوتمان: ترسناکی بزوتنەوەی (خەواریج) خۆی لەوەدا حەشاردابوو، کە ئەوان پەنایان بـۆ شۆڕشکردنو بەکارهێنانی توندوتیژی دەبرد، چونکە باوەڕیان بە بیروبۆچوونی مەزهەبەکەیان زۆر پتـەو بـوو، خۆیـان لـە پێناویـدا دەکـردە قوربـانیو، لـەو جەنگانەیانـدا کـە لەگـەڵ (ئومەوی)یەکاندا ئەنجامیاندان نموونەی زۆری ئازایەتی خۆیان نیشاندا، ئـەوان زۆر بـە تیمـە خۆکوژەکانی ئەم سەردەمە دەچوون، جار هەبوو بە ژمارەیەکی کەمی پارتیزانی سـوپایەکی گـەورەی زەبـەلاحی دەوڵـەتیان تێـك دەشـکاند، خـۆ ئەگـەر ئـەم ئازایـەتیو قوربانیـدانو هەنگاونانەیان ڕێڕەوێکی ئاشتیانەی گرتبایـەو خۆیـانو هـەوڵو تـەقالاکانیان لەگـەڵ هـەوڵو تەقالای دەوڵەت لە دژی دوژمنانی ئیسلام یـەکی گرتبایـە، ئـەوا لەوانـە بـوو بـە شـێوەیەکی ڕیشەیی مێژووی مرۆڤایەتی ڕەنگێکی تری لە ڕوو نیـشتبایەو ئـاڵوگۆڕێکی باشـتری بەسـەردا هاتبایە، لە ڕاستیدا (خەواریج) خوازیاری (دونیا) نەبوونو بە دوای (مادده)وە ویـڵ نـەبوون، بەڵکو خۆیان بۆ ئەو بیروبۆچوونە ساغ کردبۆوە کە باوەڕیان پێی بـوو و، هـەموو لایەنـەکانی ژیانی داگیرکردبوون[٣] و خۆیان لە پێناویدا تواندبۆوەو، بـەم کارەیـان هـەوڵو تـەقالاو کـاتو سەروەتو سامانو هێزێکی زۆری بەشەرییان لـە ئوممـەت بـە زایـەدا، ئەگـەر ئـەوان لـە دژی (عـەلی کـوڕی ئـەبو تالیـب)ی ئـەمیری ئیمانـداران ڕاسـت بووبنـەوەو بـە کارفریـان دانابێـتو جەنگیان لەگەڵ کردبێت، ئەوا لەمەولا بە شێوەیەکی توندترو بـە گـوڕتر هەڵوێـست لـە دژی دەوڵەتی (ئومەوی) دەنوێننو زیاتریان ڕق لێ دەبێتـەوە، ئەمـەو (معاویـە) (خـودا لێـی ڕازی بێت) لە یەکەمین هەنگاوی خیلافەتەکەیداو هێشتا لە ساڵی (٤١)ی کۆچیدا شـاری (کوفـە)ی بەجێ نەهێشتبوو لە لایەن (خەواریج)ەوە شۆڕشی چەکدارانەی لە دژ هەڵایسێنرا.[٤]

---

١ العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ٤٥٥).

٢ أسمی المطالب في سیرة أمیر المؤمنین علی ن أبي طالب (ص: ٦٣٣).

٣ العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ٤٥٨).

٤ المصدر نفسه (ص: ٤٥٨)، تأریخ خلیفة (ص: ٢٠٣، ٢٠٤).

## یەکەم: بزوتنەوەی ( خەواریج ) لە ( کوفە ):

١ـ بزوتنەوەی (فروەی کوڕی نوفلی أشجعی):

(الطبري) لە باسی ڕووداوەکانی ساڵی (٤١)ی کۆچیدا دەڵێت: لەو ساڵەدا دوای لاپەڕیوونیان لە سەردەمی (عەلی)دا لە (شارەزوور)[1]، (خەواریج) لە دژی معاویە ڕاست بوونەوە،[2] دەڵێت: لە (زیاد)ەوە قسەم بۆ کرا کە (عوانە) وتی: بەر لەوەی (حەسەن) کوفە بەجێ بێڵێت، معاویە بەرەو ئەوێ هات‌و لە (النخیلە) دابەزی، تاقمی (الحروریە)[3] کە بریتی بوون لە (٥٠٠) پێنج سەد کەس‌و بە سەرکردایەتی (فروەی کوڕی نوفلی أشجعی) لە (شارەزوور) خۆیان لاپەڕ کردبوو، وتیان: ئەمجا کاتی خۆیەتی‌و بێگومانە، بەرەو (معاویە) بەڕێ بکەون‌و جیهادی لە بەرانبەردا بکەن، ئیدی بە سەرکردایەتی (فروەی کوڕی نوفل) بەرەو کوفە بەڕێکەوتن، (معاویە) پۆلە سوارێکی شامی بۆ لای خەڵکی (کوفە) ناردو پێی گوتن: وەڵلاهی تا خەڵکە شەڕەنگێزەکانتان نەبەستنەوە لە لایەن ئێمەوە داڵدە نادرێن، جا خەڵکی کوفە چوونە دەری شارو ڕووبەڕووی (خەواریج) بوونەوەو لێیان دان، (خەواریج) پێیان گوتن: وای بۆ ئێوە چیتان لە ئێمە دەوێ، ئایا (معاویە) دوژمنی ئێمەو ئێوە نیە؟ لێمانگەڕێن با شەڕی لەگەڵ بکەین، ئەگەر بیپێکین‌و بکوژین دوژمنی ئێوە لە کۆڵ دەکەینەوە، ئەگەر ئێمەش لەنێو بچین ئەوا ئێمە لە کۆڵتان دەبینەوە، گوتیان: نا بە خوا جەنگتان لەگەڵ دەکەین، جا گوتیان: ڕەحمەتی خوا لە براکانی (نەهرەوان)[4]مان بێت، بە ڕاستی ئەوان ئێوەیان چاك ناسیبوو ئەی خەڵکی (کوفە)، تیرەی (ئەشجەع) کە لەگەڵ خەڵکی (کوفە)دا بوون لە پەنای خزمایەتیدا (فروەی کوڕی نوفل)ی سەرۆکی خەواریجیان دەستگیر کرد، دوای ئەو (خەواریج) (عبداللە ی کوڕی أبی الحر)[5]ی سەر بە تیرەی (طَيٍّ)یان

---

١ شهرزور: نیشتمانێکی فراوانەو دەکەوێتە نێوان (ئەربیل)و (هەمەدان)ەوە، دانیشتوانەکەی (کورد)ن، لە سنووری (عێراق)ی ئەمڕۆدایە، معجم أماکن الفتوح (ص: ٧٤١).

٢ تأریخ الطبري (٨١/٦).

٣ (الحروریە): بریتی بوون لە (خەواریج)، (حوراو) گوندێکە کەوتۆتە دەرەوەی (کوفە)، (خەواریج) پاش جیابوونەوەیان لە (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) لێی دابەزین، پاشان نیسبەتیان خرایە پاڵ ئەوێ، معجم البلدان (٢٤٥/٢).

٤ تأریخ الطبري (٨١/٦).

٥ یەکێك بوو لەو کەسانەی خۆی لە جەنگی (نەهرەوان) بوارد، أنساب الأشراف (١٦٤/٤).

کردە سەرۆکی خۆیان، ئیتر لێیان دان‌و کوشتیانن،[١] کەمێك بەر لە دەستگیرکرانی (فروەی کوڕی نوفلی ئەشجەعی) گوتبووی: بە خوا نازانم لەسەر چی جەنگ لەگەڵ (عەلی) دەکەین، من جارێك هیچ ڕایەکم نیە، هەتا بەرچاوم ڕۆشن نەبێتەوە، سەبارەت بە جەنگ لەگەڵ کردنی یان شوێنکەوتنی خۆم دەبوێرم، ئەمەو بە خۆی‌و پێنج سەد سوارەوە خۆی لە جەنگ بوارد.[٢]

(إبن حجر) سەبارەت بە هەڵوێستی معاویە (خودا لێی ڕازی بێت) دوای بوونی بە (خەلیفە) لە بەرانبەر (خەواریج)دا، ڕیوایەتێکی گرنگ دەهێنێت، دەقی ڕیوایەتەکە ئاوایە:.... جا خەڵك گەڕانەوەو بەیعەتیان بە (معاویە) دا، معاویە جگە لە جەنگاوەرانی (نەهرەوان)[٣] هیچ بەربەست‌و خەمێکی تری لەسەر ڕێ نەمابوو، ئیتر ئەوانیش لە هەموو لایەکەوە دادەبارین‌و بەیعەتیان پێ دەدا، لە کۆتاییدا تەنها سێ سەدو چەند کەسێك مابوونەوە کە بریتی بوون لە جەنگاوەرانی (النخیلة).[٤]

٢ـ بزوتنەوەی (المستور کوڕی عُلّفة التمیمي):[٥]

(الطبري) لە مێژووەکەیدا بە دوورو درێژی لەسەر بزوتنەوەکەی (المستور کوڕی عُلّفة التمیمي) ڕۆیشتووە، ئەو وەکو (خلیفة بن خیاط)[٦] و مێژوونووسەکانی تری نەکردووە کە بە کورتی باسیان لێوە کردووە، بەڵکو بە دوورو درێژی قسەی لەسەر کردووە، لەوانەیە ئەمە بەڵگە بێت بۆ گرنگی باسەکەو گرنگی خودی بزوتنەوەکە، چونکە ئەندامەکانی درێژەپێدەری سروشتی بیروبۆچوونی ئەو (خەواریج)انە بوون کە (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) لە (نەهرەوان) جەنگی لەگەڵ کردن، ئەمە لە کاتێکدا زۆرینەی شوێنکەوتووانی ئەم بزوتنەوەیە لە (نەهرەوان)دا هاوسەنگەریان بوون، هەر بە خاتری ئەمە بوو (موغیرەی کوڕی شوعبە)ی والی (کوفە) بۆ لێدانی ئەمانە هانای بۆ پشتیوانانی (عەلی) برد، بە تایبەتی ئەوانەیان کە بەشداری جەنگی (نەهرەوان)یان کردبوو، (معقل ی کوڕی قەیسی ریاحی) یەکێك بوو لە

---

١ تأریخ (٤/١٦٤).
٢ مرویات خلافة معاویة (ص: ١٨٢)، نقلا عن تأریخ الطبري.
٣ واتە جەنگاوەرانی بەرەی (خەواریج).
٤ بەمە ناسێران، چونکە لە (النخیلة) هاتنە کوشتن، معجم البلدان (٢/١٨٥).
٥ تأریخ الطبري (٦/٨٧ـ٩٢).
٦ مرویات خلافة معاویة (ص: ١٨٩).

سەرکردە جەنگیەکانی (عەلی) لە نەهرەوان،[١] (موغیرە) داوای لێکرد سەرکردایەتی هێرشی سەر (خەواریج)ی بۆ بکات، ئەو دەیزانی پشتیوانانی (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت) شارەزاییان لە جەنگی گەڵ ئەواندا پەیدا کردووەو دەستیان لە زەبرلێوەشاندنیاندا ڕاهاتووە، ڕیوایەتگەلی نێو مێژوونامەی (الطبري) بە دوورو درێژی هەواڵمان لەسەر ئەم ڕووداوانە پێ دەدەن، لەنێو ئەو ڕیوایەتانەدا:

أ- هەڵوێستی (خەواریج) لە بەرانبەر شەهیدکرانی (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت):

سەبارەت بە هەڵوێستیان سەرەداوێك لەم وتەیەیان وەردەگیرێت: دەك خودا ئەو دەستە نەبڕێت کە پشتەملی بە شمشێر بەرزکردەوە، وتی: جا خەڵکەکە واتە (خەواریج) سوپاسی خودایان کرد لەسەر کوژرانی.[٢]

ب - هۆکاری دەرچوونیان لە دژی موسڵمانان:

بۆ ئەمەش سوود لەم وتەی خۆیان وەردەگیرێت: با بچین بۆ لای براکانمانو بەرەو فەرمانکردن بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپەو جیهادی حیزبەکان بانگیان بکەین، چونکە حاڵی حازر کە والیەکانمان ستەمکارنو ڕێوشوێنی ئیسلام فەرامۆشکراوە ئەوانەی براکانی ئێمەیان کوشتوون لە کۆڕو کۆبوونەوەکاندا بەبێ ترس پاڵیان داوەتەوەو هیچ بیانووو بەهانەیەك بۆ ڕۆکەوتنو پاڵندانەوەمان دەست ناکەوێت، با ڕاپەڕینو تۆڵەی براکانمان بکەینەوە، ئەگەر خودا سەری خستینو بەسەر ئەواندا زاڵی کردین ئەو ڕێگە ڕووناکە دەگرینەبەر کە ڕاستو ڕێکەو جێی ڕەزای خودایەو خوداش بەمە شیفای دڵو دەروونی بە پەرۆشو برینداری خەڵکانی ئیمانداری دەدات، ئەگەر بکوژرێین، ئەوا بە جیابوونەوەمان لە ستەمکاران دەحەسێینەوەو ڕێگەی پێشەنگە پێشینەکانمان دەگرینەبەر.[٣]

ج - سیاسەتی (موغیرەی کوڕی شوعبە) (خودا لێی ڕازی بێت) لەگەڵ (خەواریج)دا:

سەبارەت بەمە سود لەمە وەردەگیرێت: خوخدەی لەگەڵ خەڵکدا ڕێکوپێك بوو، کاروکردەوەی خەڵکانی بێ بەندو باری نەدەپشکنیو پەردەی لەسەر نەنگیەکان هەڵنەدەدایەوە، یەکێك دەهاتە لای پێی دەوت: فڵانە کەس بیروڕای (شیعە)ی لە مێشکدایە، فڵانە کەسیش بیروبۆچوونی (خەواریج)ی هەیە، لە وەڵامدا دەیگوت: خودا بڕیویەتیەوە کە

---

١ المصدر نفسه (ص: ١٩٠).

٢ تأريخ الطبري (٦/٨٨).

٣ تأريخ الطبري (٦/٨٩).

دەبێ خەڵك بەردەوام لێك جیاواز بن، لەمەولاو لە گۆڕەپانی دواڕۆژدا خودا سەبارەت بە جیاوازی‌و ناكۆكیەكانی نێوانیان لێیان دەپرسێتەوەو حوكمی خۆیان بۆ دەردەكات.[١]

(موغیرە) بە (قبیصەی كوڕی الدمون)ی گوت: پەیوەندی بە (شیعە)ی (عەلی)یەوە بكە، كۆیان بكەوەو لەگەڵ (معقل ی كوڕی قەیس) كە یەكێكە لە سوپا لارەكانی (عەلی) بیانبە دەرەوەی (كوفە)، كاتێك بە یەكەوە كۆبوونەوە، پێكتر شاد دەبن‌و ئامۆژگاری یەكتری دەكەن‌و دڵسۆزی‌و پشتیوانی بۆ یەكتر دەردەبڕن، ئیدی ئەمانە بەرەو ڕووی (خەواریج) بكەوە، چونكە لە بەرانبەر ئەم ڕێزپەڕو لە ڕێ دەرچوانە زۆر بە داخن‌و ئەوەندەی ئەوان حەز بە كوشتن‌و ڕشتنی خوێنیان دەكەن‌و لە جەنگ كردنیان شارەزان‌و پێیان دەوێرن، هیچ كەس‌و كۆمەڵێكی تر شان لە شانیان نادات، ئەمانە بەر لەم جارە جەنگی تریان لەگەڵ كردوون،[٢] (موغیرە) وتی: ئەی (معقل ی كوڕی قەیس) من سوارچاكانی (مصر)ت لەگەڵ دەنێرم، فەرمانم پێكردوون خەڵكی هەڵبژاردە ئامادە بكەن، جا بە خۆت‌و بەوانەوە بڕۆ بەرەو ڕووی ئەو كۆمەڵە لە فەرمان دەرچووە ببەوە كە لە جەماعەتی ئێمە جیابوونەتەوەو شایەدی كوفریان لەسەر داوە، سەرەتا داوایان لێ بكە تۆبە بكەن‌و بێنەوە نێو بازنەی جەماعەت، ئەگەر ئەمەیان كرد لێیان قبوڵ بكەو لێیان مەدە، ئەگەر وایان نەكرد لە بەرانبەریاندا پشت بە خودا ببەستەو تەفروتونایان بكە.[٣]

س – بزوتنەوەی (حیان كوڕی ظبیان السلمي):

ئەم بزوتنەوەیە لە ساڵی ٥٨ی كۆچی‌و لە سەردەمی ویلایەتی (عبدالرحمن كوڕی عبدالله كوڕی عوسمان كوڕی ربیعة الثقفي)ی –كە دەكاتە كوڕی (أم الحكم)ی خوشكی (معاویەی كوڕی ئەبی سوفیان)دا– سەری هەڵدا، ئەم پۆلە خەواریجە لە سەردەمی ویلایەتی موغیرەی كوڕی شوعبەدا بەیعەتیان بە (مستوردی كوڕی علفە) دابوو و شۆڕشیان كردبوو، بەڵام شوعبە توانی زەفەریان پێ بەرێت‌و حەواڵەی زیندانیان بكات، جا كاتێك موغیرە مرد لە زیندان دەرچوون‌و،[٤] جارێكی تر بە سەركردایەتی (حیان كوڕی ظبیان السلمي)

---

١ تأريخ الطبري (٨٩/٦).

٢ تأريخ الطبري (١٥٥/٦)، نقلا عن مرويات خلافة معاوية (ص: ١٩٢).

٣ تأريخ الطبري (١٠٦/٦).

٤ تأريخ الطبري (٣٢٦/٦).

بزوتنەوەیەکیان لە دژی (خیلافەت) پێکهێنایەوەو ،(عبدالرحمنی کوڕی عبداللهی ثقفي)ی، (والی) کوفە سوپایەکی ناردنە سەرو هەر هەمووی کوشتن.[1]

## دووەم: بزووتنەوەکانی ((خەواریج)) لە (بەصرە)دا:

١ـ بزووتنەوەی (یزید الباهلي وسهم الهجیمي):

لە ساڵی (٤١)ی کۆچی‌و لە ویلایەتی (عبدالله کوڕی عامر)ی سەر بە (معاویە)دا (یەزیدی کوڕی مالك الباهلی) لەگەڵ (سهم کوڕی غالب الهجیمی) یاخی بوون‌و خۆیان لە لای (الجسر) مەڵاس دا، دەبینن (عباجەی کوڕی قرص اللیثي)ی سەر بە تیرەی (بنی بجر)ی هاوەڵ لەوێیەو خەریکی نوێژکردنە، بە خراپی دەزانن‌و دەیکوژن، ئەمجا گەڕانەوەو داوایان لە (إبن عامر) کرد کە چەپاڵەیان بدات، ئەویش چەپاڵەی دان‌و نامەی بۆ (معاویە) نارد: کە لەسەر ئەستۆداری تۆ دالّدەم داون، معاویە بۆی نوسیەوە: ئەمە ئەستۆداریەکە ئەگەر هەڵی وەشێنیەوە لێپێچینەوەت لەگەڵ ناکرێت، ئیدی تا لێخرانی (إبن عامر) لە پۆستی ویلایەت چەپاڵە دران،[2] ئیتر لە ساڵی (٤٦)ی کۆچیدا (سهم الهجیمی) و (یەزیدی کوڕی مالك الباهلی) ناسراو بە (الخطیم) لەگەڵ هاتنەسەر کاری (زیاد) یاخی بوون، (سهم) بەرەو (ئەهواز) ڕۆیشت‌و ئاشوب‌و بگرەوبەردەی نایەوە، ئەمجا پاشگەزبۆوەو داوای چەپاڵەدانی کرد، بەلام (زیاد) چەپاڵەی نەداو هەتا نەیگرت‌و نەیکوشت‌و بەسەر دەرگای ماڵی خۆیدا هەڵی نەواسی کۆڵی نەدا، بەلام (الخطیم) لە لایەن (زیاد)ەوە بەرەو (بەحرەین) دوور خرایەوە، ئەمجا ڕێی هاتنەوەی پێداو پێی گوت: پابەندبە بە شاری خۆتەوەو لێی دەرنەچی، بە (مسلمی کوڕی عمروی باهیلی)[3] گوت: کەفالەتی بکە، بەلام نەیکردو گوتی: ئەگەر شەوی لە ماڵی خۆی نەکردەوە پێت دەڵێم، ئەمجا ((مسلم) هاتە لای‌و گوتی: ئەمشەو (خطیم) لە ماڵی خۆی نەبوو، فەرمانی داو کوژراو تەرمەکەی ڕادەستی هۆزەکەی خۆی (باهلة) کرایەوە.[4]

٢ـ بزوتنەوەی (قریب الأزدي وزحاف الطائي):

ساڵی (٥٠)ی کۆچی‌و لە کاتێکدا (زیاد) لە (کوفە) بوو (سمرە)[5] بەسەر (بصرە)وە دانرابوو، (قریب الأزدي)و (زحاف الطائي) پورزای بە جووتە لە (بەصرە) یاخی بوون، بە

١ البدایة والنهایة (١١/٣١٣).
٢ تأریخ الطبري (٦/٣٢٦).
٣ البدایة والنهایة (١١/٣١٣).
٤ الکامل في التأریخ (٢/٤٧٧).
٥ (سمرة بن جندب الفراري)ی هاوەڵ لە (٥٨)ی کۆچی لە ((بەصرە) مرد، الاستیعاب ((٢/٦٥٣).

خۆیانو حەفتا كەسەوە ڕووبەڕووی تیرەی (بني ضُبيعة) بوونەوەو پیرەپیاوێكیان لێ كوشتن، پۆلە گەنجێك لە تیرەی (بەنی علی)و (بەنی راسب) لە دژی (قریب)و ((زحاف) راست بوونەوەو تیربارانیان كردن، (عبدالله كوڕی أوس الطائي) كوژراو كەللەسەرەكەیان هێنا، (زیاد) لەسەر مینبەر لە خەڵكی (بەصرە)ی توند كردو وتی: هۆ خەڵكی (بەصرە) بە خودا ئەگەر ئەوانەمان لە یەخە نەكەنەوە لە ئێوەوە دەست پێ دەكەمو لێتان دەدەم، سوێند بێت بە خودا ئەگەر بێڵن یەك تاكە كەسیان دەرباز بێت بە درێژایی ئەمساڵ تاكە درهەمێكتان موچە پێ نادرێت، ئیدی خەڵك لێیان ڕاپەڕینو هەر هەموویان كوشتن.[1]

٣ـ (عروەی كوڕی ئودیە)ی خاریجی:

لە ساڵی (٥٨)ی كۆچی، (عبیداللهجی كوڕی زیاد) لەسەر (خەواریج)ی توند كردو هەم لە گۆرەپانی جەنگداو هەم بە دەستگیركراویو كوشتنی لەسەرەخۆ خەڵكێكی زۆری لێ كوشتن، (عوروەی كوڕی ئودیە)ی برای (أبو بلال مرداس كوڕی ئودیە) لە ڕیزی ئەوانەدا بوو كە بە كوشتنی لەسەرەخۆ كوژران،[2] هۆكاری كوژرانی ئەمە بوو: (عبیدالله ی كوڕی زیاد) بۆ ڕمبازێنو پێشبڕكێی ئەسپسواری چووبووە دەری شار، كاتێك دانیشتو چاوەڕێی ئەسپسوارانی دەكرد، خەڵك لە دەورەی كۆببوونەوە، (عورووە)ش كە لەوێ ئامادە بوو، لە (إبن زیاد) نزیك بۆوەو دەستی بە ئامۆژگاری كردنی كردو لەنێو ڕستەی قسەكانیدا ئەم چەند ئایەتەشی بەسەردا خوێندەوە: ﴿أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ءَايَةً تَعْبَثُونَ ﴿١٢٨﴾ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴿١٢٩﴾ وَإِذَا بَطَشْتُم بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ ﴿١٣٠﴾﴾[3] واتە: ئەوە ئێوەن بەسەر هەر گردو تەپۆلكەیەكەوە كۆشكێكی بەرز بۆ شانازیو كەشو فش دروست دەكەن؟ بەڵكو نەمرنو بمێنن تاهەتایەن قەڵاو قوڵلەی مەحكەم دادەمەزرێنن؟، كاتێكیش لە خەڵك دەدەن گورزی ستەمكارانەیان لێ دەوەشێنن؟ كاتێك ئەم قسانەی دەكردنو ئامۆژگاری دەكرد، (إبن زیاد) پێی وابوو (عورووە) تەنها نیەو خەڵكێكی زۆری لە پشتە، هەستاو سوار بووو پێشبڕكەكەی بەجێ هێشت، بە (عورووە) گوترا: بە خودا دەتكوژێت، لە ترسان خۆی حەشاردا، (إبن زیاد) داوای كرد، ئەویش بەرەو (كوفە) هەڵات، لەوێ گیراو هێنایانە لای (إبن زیاد)، جا هەردووك

---

١ الكامل في التأريخ (٢/٤٨٢).

٢ تأريخ الطبري (٦/٢٣٠).

٣ الشعراء (١٢٨ـ١٣٠).

دەست‌و هەردووك قاچی بڕینەوە،[١] .... بەم حاڵە هێنایانە بەرانبەر خۆی‌و لێی پرسی: ڕات چۆنە؟ (عورەوە) وتی: پێم وایە دنیای منت شێواندو دوارۆژی خۆشت تێکدا، جا کوشتی‌و بە دوا کچەکەیدا ناردو ئەویشی کوشت،[٢] بە هۆی ئەوە لەسەر مەزەبی باوکی بوو کوشتی.[٣]

(المبرد) لە کتێبی (الكامل في اللغة)دا سەبارەت بە کوژرانی (عورەوەی کوڕی ئودیە) دوو هۆکاری سەرەکی دێنێت‌و دەڵێت کاریگەری گەورەیان لەسەر ئەم کوشتنە هەبووە: هۆی یەکەم: ئەم کابرا سەر بە (خەواریج)ە (عوسمان‌و عەلی) (خودا لێیان ڕازی بێت)ی بە کافر دادەنان، هۆی دووەم: کاتێك (مرداسی کوڕی ئودیە)ی برای یاخی بوو هاوکاری دەکرد.[٤]

٤ـ بزوتنەوەی (مرداسی کوڕی ئودیە):

ساڵی (٥٨)ی کۆچی لە ئەهواز (مرداسی کوڕی ئودیە) یاخی بوو، بەر لەمە (عبیداللە کوڕی زیاد) لەگەڵ ژمارەیەك (خەواریج) بەندی کردبوو، بە هۆی پەرستن‌و کۆششکردنی زۆریەوە سەرۆکی زیندان ڕێی چوونە دەرەوەی دەدا، ئەویش لەگەڵ هەڵاتنی سپێدەی بەیانی دەهاتەوە بەندیخانە، (مرداس) هاوڕێیەکی هەبوو شەوان لەگەڵ (إبن زیاد) دادەنیشت، شەوێك (إبن زیاد) دەڵێت: بڕیارم داوە بەیانی (خەواریج)ەکان بکوژم، کابرا خێرا دەچێتە ماڵی (مرداس) هەواڵەکەیان پێ ڕادەگەیەنێت‌و دەڵێت: یەکێك بۆ لای (أبو بلال) بنێرن با خۆی بۆ ئەمە ئامادە بکات، (مرداس) گوێی لەم قسانە دەبێت هەمان هەواڵیش بە سەرۆکی زیندان دەگات‌و ئەو شەوە هەر خەفەت دەخوات‌و دەترسێت (مرداس) هەواڵەکە بزانێت‌و نەگەڕێتەوە بۆ زیندان، کاتێك وادەی گەڕانەوەی هات، (مرداس) دەرکەوت‌و هاتەوە، سەرۆکی زیندان پێی گوت: هەواڵی بڕیارەکەی ئەمیر (عبیداللە)ت پێ نەگەیشتووە؟ وتی: بەڵێ پێم گەیشتبوو، گوتی: سەرەڕای ئەوەش گەڕایتەوە! وتی: بەڵێ، ئاخر پاداشتی تۆ ئەوە نیە بە هۆی چاکە لەگەڵ کردنمدا سزا بدرێی، (عبیداللە) بەیانی ڕاست بۆوەو دەستی بە کوشتنی (خەواریج)ەکان کرد، ئەمجا سەرە گەیشتە سەر (مرداس)و بانگی کرد، کاتێك ئامادە بوو، سەرۆکی زیندان –کە شوی دایەنی منداڵە ساواکەی (عبیداللە) بوو–، ڕەق ڕاماو

---

١ الكامل في التأريخ (٢/٥١٧).

٢ أنساب الأشراف (٤/٣٨٧، ٣٨٨)، تأريخ الطبري (٦/٢٠٥).

٣ مرويات خلافة معاوية (ص: ٢٠٤).

٤ الكامل في اللغة (٣/١٠٩٨)، نقلا عن مرويات خلافة معاوية (ص: ٢٠٥).

لە نکاو خۆی بەسەر دەست‌و قاچی (عبیدالله) داداو وتی: کە دەبێ ئەمە بە من ببەخشی، ئەمجا باس‌و خواسەکەی بۆ گێڕایەوە، جا بە ئەوی بەخشی‌و ئازادی کرد.[1] (البلاذري) ئاماژە دەدا: بە هۆی ئەوە هەندێك لە بەندکراوەکان (لەو شەوەدا) یەکێك لە پاسەوانان دەگرن‌و دەیکوژن، ئەوا (عبیدالله)ش بڕیاری دا هەر هەموویان بکوژێت.[2]

دوای ئەمە (مرداس) لە (إبن زیاد) ترساو بە خۆی‌و چل کەسەوە بەرەو (أهوان) هەڵات، ئەگەر جاروبار پارەو سامانێکی (بیت المال) بە پەنایاندا تێپەڕیبایە بەشی خۆی‌و هاوڕێکانی لێ هەڵدەگرت‌و باقیەکەشی دەدانەوە، کە (إبن زیاد) هەواڵی ئەوانی پێگەیشت، لە ساڵی (٦٠)ی کۆچیدا سوپایەکی دوو هەزار نەفەری بە سەرکردایەتی (أسلم ی کوڕی زەرعەی کیلابی)، دەشگوترێت بە سەرکردایەتی (أبو الحصین التمیمی) بۆ بەڕێکردن، کاتێك سوپای ناوبراو گەیشت، (أبو بلال مرداس) خودای بە گژدا کردن کە شەڕی لەگەڵ نەکەن، بەڵام بە قسەیان نەکرد، (أسلم) داوای لێکردن بێنە نێو (جەماعەت) گوتیان: بۆ لای (إبن زیاد)ی لاڕێمان دەگێڕیەوە؟ ئیدی جەماعەتی (أسلم) دەستیان بە تیرهاویشتن کردو یەکێکیان لە هاوەڵانی (أبو بلال) کوشت، (أبو بلال) ڕووی لە هاوڕێکانی کردو وتی: ئەوان دەستپێشخەری جەنگیان کردو دەستیان وەشاند، ئیتر کۆمەڵی (خەواریج) بە یەك گوڕ هەڵمەتیان بردو هێندەی نەخایاند (أسلم)و سوپاکەی بەزین‌و بەرەو (بەصرە) گەڕانەوە، (إبن زیاد) (أسلم)ی سەرکۆنە کرد، پێی گوت: دوو هەزار جەنگاوەرت بە پشتەوە بوو، لە بەرانبەر کۆمەڵێکی چل کەسی بەزی‌و هەڵاتی؟، هیچ خێروبێرت پێوە نیە؟، (أسلم) وتی: ئەگەر زیندوو بم سەرکۆنەم بکەی پێم باشترە، لەوەی مردوو بم‌و ستایشم بکەیت‌و بە شان‌و باڵمدا هەڵبڵێی، کاتێك منداڵ (أسلم)یان دەبینی، هۆسەیان بۆ لێ دەداو پێیان دەگوت: هەڵێ ئەوە (أبو بلال) بە دواتەوەیە! (أسلم) چووە لای (إبن زیاد)و شکاتی لێکردن، (إبن زیاد) فەرمانیدا ئەمە نەکەن، جا ئەوانیش کۆڵیان لێدا،[3] ئەمانەی باسمان کردن دیارترین بزووتنەوەکانی (خەواریج)ی سەردەمی (معاویە) بوون.

---

١ تأريخ الطبري (٦/٢٣١).

٢ أنساب الأشراف (٤/١٨١).

٣ الكامل في التأريخ (٢/٥١٨).

## سێیەم: گرنگترینو بەسودترین وانەو پەند:

ئەمانەی دادێن بریتین لە گرنگترین ئەو وانەو پەندانەی لە میانەی جەنگکردنی (معاویە) لەگەڵ بزوتنەوەکانی (خەواریج) سودیان لێ دەبینرێت:

١- کاتێك سەرنج لە ئاکاری (خەواریج)ەکانی سەردەمی معاویە دەدەین، دەبینین: ئامانجی یاخی بوونەکانیان خۆی لە هەراسانکردنو لاوازکردنی حوکمی (بەنی ئومەیە)دا کورت هەڵێناوەو تۆزقاڵێك ئومێدی بە ڕوخانی نیە.[١]

٢- هەندێك لەو بزوتنەوانە لەو گروهە (خەواریج)انە پێکهاتبوون کە لە جەنگی (نەهرەوان)دا پاشەکشەیان کردبوو، لە دێهاتەکاندا پەرتو بڵاو ببوونەوە، هیچ ئاماژە بە (خەواریج)ە نیشتەجێکانی (کوفە) نادات کە بەشداری ئەم بزوتنەوانەیان کردبێت، ئەمە جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە ئەمانە لەگەڵ ڕوودانی ئاڵوگۆڕ بەسەر دەسەڵاتدا هیچ گۆڕانکاریەك بەسەر هەڵوێستیاندا نەهاتووە.[٢]

٣- وەك تێبینی دەکرێت ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانی (کوفە) بە حەماسەتو گەرموگوڕییەوە بەشداری جەنگی دژ بە (خەواریج)ەکانیان کردووە، لە ڕوویەکەوە بە بیروبڕوای ئێمە هەڕەشەکانی (معاویە) لە خەڵکی (کوفە)و داخی زۆرێك لە کوفییەکان لە (خەواریج) بە هۆی هەڵوێستی نادروستیان لە بەرانبەر (عەلی)دا کاریگەری چاکی لەسەر (کوفە)ییەکان دروست کردووە، تا بەم شێوە چوستو چالاکیە بەشداری سەرکوتکردنی بزوتنەوە شۆڕشچیەکان بکەن، لە لایەکی تریشەوە ئەوە بە دوور نابینین کە کوفەییەکان حەزیان بە یەکێتیو یەکڕیزی موسڵمانان کردبێتو، ئەگەرچی لەسەداسەد زانیویانە لە حوکمەتی تازەدا بۆ خۆیان پلەو پۆستی بەرز لە دەست دەدەنو شارەکەشیان ئەو جێگەو پێگە بەرزەی لێ دەستێنرێت کە لە سەردەمی خیلافەتی (عەلی)دا هەیبووە، بەڵام سەرەڕای ئەمەو بە خاتری ئەو یەکڕیزیو یەکێتیەی باس کراو بۆ لەنێوبردنی هێزە بەرهەڵستکارەکان پشتیوانییان لە معاویە کردبێت.[٣]

٤- معاویە (خودا لێی ڕازی بێت) شارەزای ناخو نێوەڕۆکی تەواوی بزوتنەوەکانی (خەواریج) بووو دەیزانی هەڵوێستیان لە بەرانبەر حوکمەت بە گشتیو خودی خۆیدا

---

١ الخوارج في العصر الأموي، نايف معروف (ص: ١٣٠).

٢ حركة الخوارج، لطيفة البكّاي (ص: ٦٠).

٣ حركة الخوارج (ص: ٦٠).

چەندە توندە، لەبەر ئەمە کاری بۆ گێڕانەوەی ئەوان بۆ نێو ڕیزەکانی خۆی نەکرد، بەڵکو لە یەکەم ساتەوەختەوە بڕیاری دا بە هێزو دەسەڵات بەرەنگاریان بێتەوە.[1]

٥- (موغیرەی کوڕی شوعبە) هەردوو هێزی سوپاو شورتەی لە جەنگی (خەواریج)دا بەکارهێنانو هەواڵی لەسەر هەر کەسێکیش پێگەیشتبایە کە نیازی دەرچوونی هەیە هێزی لە دژ بەکاردێنا، (موعینی کوڕی عبدالرحمن ی موحاریبی)و (حیّانی کوڕی ظبیانی سەلەمی)و کەسانی تریش لە ڕیزی ئەو کەسانەدا بوون، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە: کە (موغیرەی کوڕی شوعبە) چاودێری توندی جموجۆڵی (خەواریج)ەکانی نێو شاری (کوفە)ی کردووەو بە گوێرەی هەواڵو گوزارشتی سیخوڕەکانی خۆی سزای دەدانو دەیگرتن.[2]

٦- گرنگترینو سامناکترین کاری (موغیرە) (خودا لێی ڕازی بێت) ئەمە بوو: ئەو بە سود وەرگرتن لە دوژمنایەتی کۆنینەی نێوان لایەنگرانی (عەلی) (خودا لێی ڕازی بێت)و (خەواریج)، لایەنگرانی (عەلی) لە دژی (خەواریج) بەکارهێنان، دەوڵەتی (ئومەوی) لە هەردووك ئاستی دوورو نزیکدا سودی لەم سیاسەتە وەرگرت، لەسەر ئاستی نزیك: (موغیرە) لە (کوفە)دا چالاکیەکانی خۆی لەسەر بیروبۆچوونەکانی (خەواریج) چڕکردنەوەو بەبێ ئەوەی دەوڵەت هیچ زیانێکی وای لێ بکەوێت شایانی باس لێکردن بێت بەرهەڵستکارەکانی نێو شاری بێدەنگ کردنو لە دژایەتیکردنی دەوڵەتی دوورخستنەوە، بەمە دەوڵەت دەرفەتێکی گەورەی وەرگرتو دەسەڵاتی خۆی ئەستور کرد.[3] لەسەر ئاستی دووریش: (موغیرە) دوژمنایەتی نێوان (خەواریج)و (شیعە)ی قوڵتر کردو کارێکی وای کرد لێك نزیکبوونەوەی ئەم دوو بزوتنەوە تا ماوەیەکی درێژخایەن مەحاڵ بێتو بەمەش دەوڵەتی ئومەوی لە بەرانبەر ڕووبەڕووبوونەوەی بزوتنەوەیەکی یەکگرتووی زلهێز دوورکەوێتەوە، دەبێ ئەوە بزانین کە (موغیرە) تەنها جێبەجێکەری سیاسەتو فەرمانەکانی (خەلیفە) بوو لە بەرانبەر بزوتنەوە بەرهەڵستکاریەکانی نێو (کوفە)داو، دەشبێت بۆ خۆی هەندێك ڕاو ئیجتیهادی وای هەبوبنو بۆ خزمەتکردنی زیاتری (دەوڵەت) جێبەجێی کردبن[4].... بەڵام سەبارەت بە پشتیوانانی (عەلی)ی ئەمیر ئیماندارانی (خودا لێی ڕازی بێت) بە شێوەیەکی گشتیو سەرۆکەکانیان بە تایبەتی، (دەوڵەتی ئومەوی) هەوڵیدا لە خۆیان نزیك بخاتەوەو بە

---

١ حركة الخوارج (ص: ٦٠).

٢ حركة الخوارج (ص: ٦٥).

٣ حركة الخوارج (ص: ٦٥).

٤ حركة الخوارج (ص: ٦٦).

لای خۆیدا ڕایانکێشێت، لەبەر ئەمە (موغیرە) بە پەیڕەوکردنی سیاسەتی نەرمونیانی هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەنواندن، بە هۆی ئەمە لە درێژەی ویلایەتی ئەودا شاری (کوفە) هێدیو هێمن بوو.[١]

٧ــ هەر کە (زیاد بن أبیە) بوو بە والی (بصرە) ڕاوەدونانو سەرکوتکردن لەسەر (خەواریج) توندتر کراو، وێڕای کوشتن، (زیاد) لاشەی کوژراوەکانی دەشێواندنو ئەمجا لە شوێنە گشتیەکاندا یان لە گەڕەکەکانی خۆیاندا هەڵیدەواسین، ئەمەو شێواندن ژنو پیاوی (خەواریج)ی وێکڕا دەگرتنەوە، جا لەگەڵ ئەوەدا شێواندنی لاشەی کوژراو لە ڕیزی کارە قێزەونەکان دەژمێردرێتو پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە بەرانبەر کافریشدا قەدەغەی کردووە، بەڵام (زیاد) بە خاتری ترساندنو تۆقاندنی خەڵكو کپکردنەوەیان ئەم ڕەفتارەی لە دژی موسڵمانانی ژنو پیاو بەکارهێنا، سزاکانی سەر (خەواریج) لە کوشتنو شێواندنو گیرانو دەست بەسەریدا کورت هەڵنەهاتبوون، بەڵکوسزای موچەبڕینو برسیکردنیشی گرتبۆوە، (زیاد) لەم بوارەدا لە سنووری حوکمڕانەکانی پێش خۆی تێپەڕاندو ناوی (خەواریج)ەکانی لە تۆماری (دیوان)دا سڕینەوە.[٢]

٨ــ (زیاد) توندو تیژی خستە نێو سیاسەتی دەوڵەتەوە، بەڵکو وەکو یەکێك لە پایە ڕاگرەکانی ئەو دەوڵەتە قیتی کردەوەو، پێی وابوو بەرژەوەندی دەوڵەت وا دەخوازێت لە دژی ئەو کەسانە بەکاربهێنرێت کە گەردنی بۆ کەچ ناکەنو نایەنە ژێر باری فەرمانەکانیەوە.[٣]

٩ــ سیاسەتە توندو تیژەکەی (زیاد) تەواوی جموجۆڵەکانی (خەواریج)ی دامرکاندنەوەو، سامو هەیبەتی (دەوڵەت)ی خستە دڵی هەموو خەڵکەوەو، تیرەو هۆزەکانی کردنە لایەنگری خۆیو، پاش ئەوەی کە ئەرکەکانیان لە پێدانی سەرانەو ئەنجامدانی ئەرکی سەربازیدا کورت هەڵاتبوو، بەڵام لەمەودوا ڕۆڵی خۆیان لە بواری دابینکردنی ئاسایشی نێو شاریشدا دەگێڕا، لە لایەکی ترەوە هاریکاریو دەستباری تیرەگەری لاواز بووو، خودی تیرە نەیدەتوانی ئەو کەسانەی سەر بە خۆی بپارێزێتو بحەوێنێتەوە کە لە دژی حوکومەت یاخی دەبوونو دەردەچوون، بەڵکو دەوڵەت ئەو تیرانەی ناچار دەکردن کوڕەکانیان دەستگیر بکەن جاروبارەش سزایان بدەن، هەرچەندە (زیاد) لە دامرکاندنەوەی جموجۆڵی بەرهەڵستکارانو چاندنی تۆوی ترسو بیم لە دڵو دەروونی تەواوی خەڵکی (عێراق)دا سەرکەوتنی بەدەست

---

١ حركة الخوارج (ص: ٦٦).

٢ صدر الاسلام والدولة الأموية، محمد عبدالحي شعبان (ص: ٩٩)؛ الخوارج، لطيفة البكائي (ص: ٧٠).

٣ حركة الخوارج، لطيفة البكائي (ص: ٧١).

هێناو توانی لە کەش‌و هەوایەکی ئازادو سەربەخۆوە بیانکات بە ڕەعیەتێکی گەردنکەچی تەواو عەیاری دەزگاکانی دەوڵەت، بەڵام لە خنکاندنی ئیرادەی بەشێکی زۆری (خەواریج) لە دژی دەوڵەتدا سەرنەکەوت، وەك دەبینین لە سەردەمی ویلایەتی (عبیداللە)ی کوڕی دا ڕاپەڕینی گەورە لە لایەن هۆزەکانی عێراقەوە ئەنجامدران.[١]

١٠- (عبیداللە ی کوڕی زیاد) لە سەرکوتکردنی (خەواریج)دا سنووری (زیاد)ی باوکی بەزاندو، بە یەکسانی سزای بەسەر خەڵکانی ئاشکراو نهێنی ئەو پێڕەدا دەسەپاند، لە کاتێکدا کە کوشتن سزای پەسەندکراوی ئەوبوو، بەڵام جاروبار هەندێکیشی لێ بەند دەکردن، جاریش هەبوو لە ژێر کاریگەری گەورەو مامۆتکی هۆزەکانەوە لەگەڵ سەپاندنی دەستبەسەری بەسەریانداو دانانی چاودێرو سیخوڕ بەسەر خۆیان‌و هەڵسوکەوتەکانیانەوە هەندێکی لێ ئازاد دەکردن، بەڵام سەرەنجام بە هۆی سەرپێچی‌و لادانیان لە فەرمان زۆربەی ئەوانەش بە سزای کوشتن دەگەیەنران... (إبن زیاد) بە تەما ئەوە نەبوو گروهی (حەڕوریە) (واتە خەواریج) لە دژی ڕاپەڕن، ئەو هەمیشە هەموو جۆرە هۆکارێکی بۆ دۆزینەوەو دیاریکردنی ئەوان بەکاردەهێنا، یەکێك لەو هۆکارانە ئەمە بوو: لە ڕێی پێدانی سامان هانی دانیشتوان‌و هۆزەکانی دەدا چاودێری ڕۆڵەکانیان بکەن‌و سەبارەت بەمە ڕاپۆرتە هەواڵ پێشکەش بە خۆی یان یاریدەدەرەکانی بکەن، ئەم هۆکارە سەری کێشا بۆ دەستگیرکردنی ژمارەیەکی زۆر لە هەڵگرانی بیروبۆچوونی (خەواریج)و هەوادارانی‌و هەر کەسێکیش گومانی ئەوانی لەسەر بێت، هاوکات لەگەڵ ئەمەدا دەروازەی قسەهێنان‌و بردن‌و هەڵبەستنی بوختان‌و پێوەکردنی خەڵك بە ناهەق ئاوەڵا بوو[٢] بەمە پشکۆ کۆنەکانی ڕق‌و قینەی نێوان هۆزەکان گەشانەوەو ناکۆکی نوێی لە نێوان خەڵکدا خوڵقاند.[٣]

١١- نیشانە سەرەکیەکانی بزوتنەوەکانی (خەواریج) لە خیلافەتی (معاویە)دا (خودا لێی ڕازی بێت) بەم شێوەیە بوون:

أ- بێ بەرنامەیی‌و سەرپێچی‌و ناڕێکوپێکی.

ب - چالاکیەکانیان زیاتر بە چالاکی خۆکوژی دەستەجەمعی دەچوون، ئەوان بە ژمارەی کەمەوە خۆیان دەردەخست‌و هێندەی نەدەخایاند لە ڕەگ‌و ڕیشە دەردەهێنران‌و لەنێو دەبران.

---

١ حركة الخوارج (ص: ٧١).

٢ حركة الخوارج (ص: ٧٤).

٣ حركة الخوارج (ص: ٧٤).

ج ـ نەبوونی سەرکردایەتیەکی بەهۆشو گوشو زیرەكو زرنگی وا بتوانێت لە پێناوی بەدیهێنانی ئامانجەکانیاندا سود لە ئازایەتیو مێرخاسیو سوارچاکیان وەربگرێتو نەیەڵێ بەرهەمیان بە زایە بڕوات.

ح ـ بزوتنەوە یەك لە دوایەکەکانیان هەڵەکانی یەکتریان دووبارە دەکردنەوەو هیچ کامێکیان نەیدەویست پەند لە بزوتنەوەکەی پێش خۆی وەربگرێت.

خ ـ لە بانگەوازکردنی خەڵکدا خۆیان لە شێوازی گفتوگۆو ڕووبەڕووبوونەوە دەبواردو هەوڵیان دەدا بە زەبرو زەنگ بۆچوونەکانیان بەسەر کۆمەڵگای ئیسلامیدا بسەپێنن.

س ـ تێکەڵکردنی کۆمەڵە پاڵنەرێکی دەمارگیریی جاهیلی لە هەڵسوکەوتو جموجۆڵەکانیاندا بە کۆمەڵە پاڵنەرێکی دینی کە بە حیسابی خۆیان پەلکێشی گۆڕەپانی موعارەزەی کردبوون، ئەمە لەو دەمانەدا خۆی دەنواند کە دەستەیەکیان بۆ تۆڵەسەندنەوەی هەندێك لە هاوڕێ کوژراوەکانیان ڕادەپەڕین.

ع ـ هەستکردن بە نامۆیی لەنێو کۆمەڵگای موسڵمانداو قەناعەتدان بە خۆیان کە کوشتاری ئەهلی قیبلە لە جیهادی کافران لە پێشترە.

ل ـ نەگەڕان بە دوای خاكو وڵاتێکی تازە تا بانگەوازەکەی خۆیانی تێدا بڵاو بکەنەوەو کورتهەڵێنانی لە چەند شارێکی عێراق، بە تایبەتیش (کوفەو بەصرە).

ك ـ بە خاتری فەرمانکردن بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپە ڕێبازێکی خراپو نارێکیان گرتبووەبەر، کە بریتی بوو لە ڕێبازی ڕەشەکوژکردنی خەڵك، هۆکاری ئەم ڕەفتارەیان دەگەڕێتەوە بۆ کەمی زانستیانو تێنەگەیشتنیان لە دین، چونکە پەرستنو بەندایەتیکردنی زۆر نابێتە بەڵگەی زانایی کەس، ئەگەر وابوایە (خەواریج) زاناترین کەسانی سەردەمی خۆیان دەبوون.[1] بەڵام ئەوان وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەیان دەفەرموێت: ((يحتقرُ أحدكم صلاتهُ مع صلاته، وصيامه مع صيامه، يَمرُقون من الدين كما يَمرقُ السَّهمُ من الرَّمِيَّة))[2] واتە: هەر یەکێکیان نوێژی خۆی بە کەم دەزانێ لە بەرانبەری نوێژیداو ڕۆژی خۆی بە کەچوکرۆچ دەزانێ لە بەرانبەر ڕۆژوی ئەودا، تیر چۆن لە کەوان دەردەچێت ئەوانەش ئاوا لە دین دەردەچن.

---

١ مرويات خلافة معاوية في تأريخ الطبري (ص: ٢١٠).

٢ البخاري مع الفتح (١٢/٢٠٣).

و- پرۆسە گۆڕانکاریەکەیان پێویستی بە پشودرێژیو بارقوڵیو خۆڕاگری هەبوو، بەلام ئەوان لەم ڕووەوە هەژارو نەدار بوون.

١٢- تکای لێخۆشبوون بۆ ژمارەیەك (خەواریج)و ئامۆژگاریکردنی (معاویە) لە لایەن (أبوبکرة الثقفي)یەوە:

ساڵی (٤١)ی کۆچی (حمران ی کوڕی ابان) دەستی بەسەر (بصرە)دا گرت، معاویە بە مەبەستی کوشتنی (حمران)و لایەنگرانی سوپایەکی بەسەر کرد، (أبوبکرة الثقفي) هاتە لایو داوای لێکرد چاوپۆشی بکاتو لێیان ببورێت، ئەویش لێیان خۆش بووو ئازادی کردنو (بسر بن أبي أرطأة)ی کردە والی (بەصرە)[1].... (معاویە) بە (أبي بکرة)ی گوت: ڕاسپاردەو ئامۆژگاریەکت نیە بۆ ئێمە؟ گوتی: بەڵێ، ئەی ئەمیری ئیمانداران، وەسێتت بۆ دەکەم کەوا بەرژەوەندی خۆتو ڕەعیەتەکەت ڕەوچاو بکەیتو کاروکردەوەی چاك ئەنجام بدەی، چونکە تۆ کارێکی گەورەو گرانت کەوتووەتە سەر شان، کاری جێنشینایەتیکردنی خودا لە بەرانبەر دروستکراوەکانیدا، پارێز لە خودا بکە، خالێکی کۆتاییت هەیەو ناتوانی لێی تێپەڕی، داواکەرێکی بە هەڵەداوانت بە دواوەیە، خەریکە دەگەیتە دواخاڵو داواکەرت پشتەملت دەگرێت، جا دەگەڕێیتەوە بۆ لای زاتێك لەسەر وردو درشتی کردەوەکانت لێت دەپرسێتەوە، لە خۆت بە خۆت زاناترە، ئەمە تەنها ڕاگرتنو لێپرسینەوەو لێپێچینەوەیە، مادام سەرەنجام ئاوایە هیچ شتێك بەسەر ڕەزامەندی خودادا هەڵمەبژێرە.[2]

١٣- بەکارهێنانی سیاسەتی هەست بزواندن:

(حوثرەی کوڕی وداعی کوڕی مسعودی ئەسەدی) لە دژیدەوڵەتی (ئومەوی) دەرچوو، (معاویە) باوکی (حوثرە)ی بانگ کردو پێی وت: بچۆ بۆ لای کوڕەکەت بەڵکوبە بینینی تۆ دڵی نەرم بێتو (بگەڕێتەوە)، جا چوو بۆ لای قسەی لەگەڵ کردو زۆری لەبەر هەڵخوێندو وتی: با بچم کوڕە جگەرگۆشەکەت بۆ لا بێنم، بەڵکو کە چاوت پێ بکەوێت دڵت نەیات لێی جیابیتەوەو بەجێی بێڵی؟!. گوتی: من ئەو ساتەوەختەم لە بینینی کوڕەکەم پێ خۆشترە کە بە تیری دەستی کافر دەپێکرێمو تل دەخۆم. باوکی هاتەوە لای (معاویە)و قسەی

١ البداية والنهاية (١١/١٤٩).
٢ البداية والنهاية (١١/١٥٠).

کوڕەکەی بۆ گێڕایەوە، ئیدی لە مانگی جەمادی دووەمی ساڵی ٤١ی کۆچیدا معاویە سوپایەکی دوو هەزار کەسی بە سەرکردایەتی (عبدالله ی کوڕی عوف الاحمر) بۆ بەرپێکردن، باوکی (حوثرة)ش لە ریزی سوپاکەدا بوو، داوای لە (حوثرة) کرد بێتە گۆڕەپان‌و زۆرانبازی لەگەڵ بکات، گوتی: بابی خۆم خەڵکی تر هەیە چاکتر دەرفەتی بێ، ئەمەو (إبن عوف) بە خۆی‌و سوپاکەیەوە پێیان هەڵشاخا، بەڵام چاکیان خۆڕاگرت، (حوثرة) لەبەر (عبدالله ی کوڕی عوف) ڕاچوو، (عبدالله) نەشتەرێکی لێداو کوشتی، هاوڕێکانیشی (جگە لە پەنجا کەس کە گەڕانەوە کوفە) دەنا هەر هەموویان کوژران.

(حوثرة) پەرستنی زۆر بوو، (إبن عوف) نیشای سوژدەی لەنێو تەختایی نێوچاوانی بەدی کرد، بۆیە لە کوشتنەکەی پەژێوان بۆوەو گوتی:

قتلت أخا بني أسد سفـــاهاً　　لعمر أبي فما لقيتُ رُشدي
قتلتُ مصلياً محياء ليـــــلٍ　　طويل الحـــزن ذابرٍ وقصد
قتلت أخا تقي لأنال دنيـــا　　وذاك لِشقـوتي وعِثار جَدِّي
فهب لي توبة يـــارب واغفــر　　لما فارقت من خطاء وعمد[١]

## چوارەم: هەندێك هۆنراوەی ( خەواریج )ی سەردەمی معاویە ( خودا لێی ڕازی بێت ):

١ـ مەعازی کوڕی جوینی کوڕی الحصین لە زیندانی (موغیرەی کوڕی شوعبە)دا ئاوا دەڵێت:

ألا أيها الشارون قد حان لامرئ　　شــرى نفســـه لله أن يترحلا
أقمتـــم بدار الخاطئـــين جهـالة　　وكل امرئ منكم يُصادُ لِيُقتَلا
فشُدّوا على القوم العــداة فإنمـا　　أقامتكم للذبـــح رأيـــاً مضللا
ألا فاقصدوا يــا قوم للغاية التي　　إذا ذكــرت كـــانت أبر وأعدلاً
فياليتني فيكـم علـى ظهر سابح　　شديد القصيرى دارعاً غير أعزلا
وياليتني فيكم أعـــادي عدوّكـــم　　فيسقيني كـــأس المنيـــة أولاً

١ الكامل في التأريخ (٣/٤٥٠).

يعز علي أن تخافوا وتطردوا ولَمّا أُحَرِّدُ في المحلين منصلا
ولما يفرق جمعهم كلُّ ماجد إذا قات ولّى وأدبر أقبلا
مشيحا بنصل السيف في حمس الوغى يرى العبر في بعض المواطن أمثلا
وعزّ عليَّ أن تصابوا وتنقصوا وأصبح ذابت أسيراً مكبلا
ولو أنني فيكم وقصدوا لكم أثرت إذا بين الفريقين قسطلاً
فيارُبَّ جمع قد فللت وغارة شهدت وقرنٍ قد تركت مجدلاً[1]

٢ـ كاتێك (مرداس أبو بلال كوڕی ئودیە)ی سەر بە تیرەی (ڕەبیعە) بە خۆی‌و چل كەسەوە بەسەر سوپایەكی دوو هەزار كەسی (عبیدالله ی كوڕی زیاد)دا سەركەوت، پیاوێك لە هۆزی (بني تيم الله ی كوڕی ثعلبة) ئەم هۆنراوەی گوت:

أألفا مؤمن منكم زعمتم ويقتلهم بآسك[2] أربعونا
كذبتم ليس ذاك كما زعمتم ولكنّ الخوارج مؤمنونا
هي الفئة القليلة قد علمتم على الفئة الكثيرة ينصرونا[3]

بە گوێرەی گێڕانەوەیەكی تر هۆنراوەیەك دراوەتە پاڵ (عیس ی كوڕی فاتك)و تێیدا دەڵێت:

فلما أصبحوا صلوا وقاموا إلى الجُرد العتاق مسوَّمينا
فلما استجمعوا حملوا عليهم فظل دوو الجعائل يقتلونا
بقية يومهم حتى أتاهم سوادُ الليل فيه يراوغونا
يقول بصيرهم لما أتاهم بأن القوم ولو هاربينا
أألفا مؤمن فيما زعمتم يهزمهم بآسك أربعونا[4]

---

١ الكامل في التأريخ (٢/٤٥٠).
٢ (آسك) شارێكە لە هەرێمی (ئەهواز)، معجم البلدان (١/٥٣).
٣ تأريخ الطبري (٦/٢٣١، ٢٣٢).
٤ أدب السياسة في العصر الأموي (ص: ٢٢٠)، نقلا عن تهذيب الكمال (١/ ١٠٥).

# باسی پێنجەم

## ( سیستەمی دارایی ) لە سەردەمی معاویەدا ( خودا لێی ڕازی بێت ):

## یەکەم: سەرچاوەکانی داهاتی دەوڵەت:

**١ـ زەکات:**

لە سیستەمی ئابووری ئیسلامدا بە گرنگترین ڕەگەزی دارایی دادەنرێت، بە قورئان‌و سوننەت چەسپاوە، خودای بەرزو پاك دەفەرموویت: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعْبُدُواْ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلْقَيِّمَةِ ﴿٥﴾﴾[1] واتە: تەنهاو تەنها فەرمانیان پێکراوە: خودا بە پاك‌و پوختی بپەرستن‌و گەردنکەچیەکی ڕێکوپێکی بۆ ئەنجام بدەن‌و نوێژ بەرپابکەن‌و زەکات بدەن، ئەمە ڕاستەشەقامی ڕێکە. بە هەمان جۆر بە حوکمی ئەوە (زەکات) یەکێکە لە پێنج پایەکانی ئیسلام، موسڵمانان بە (ئیجماع) یەکدەنگن لەسەر (واجب)بوونی، بەڵگەی ئەمە: هاوەڵانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە سەردەمی (أبوبکری صدیق) (خودا لێی ڕازی بێت)دا هەر هەموویان ڕێکەوتن لەسەر لێدان‌و کوشتاری ئەوانەی دەیانگوت نایدەین.[2] ئەرکی کۆکردنەوەو دابەشکردنی لە ئەستۆی حوکمڕاندایە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) کۆی دەکردەوەو دابەشی دەکرد، (أبوبکرو عمر)یش ئاوایان دەکرد، بەڵام لە کاتێکدا لە سەردەمی (عوسمان)دا سەروەت‌و سامان زۆر بوو، (عوسمان) سەبارەت بە سامانی پەنهان بڕیاری دا زەکاتدەرەکان بە وەکالەتی ئیمام زەکاتەکەی خۆیان بەسەر موستەحەقاندا دابەش بکەن،[3] بەڵام سەبارەت بە سامانی دیارو بەرچاوی وەکو دەغڵ‌و دان‌و ئاژەڵ‌و شتی لەم جۆرە، بەردەوام دەوڵەت وەری دەگرت‌و بەسەر شوێنە شیاوەکاندا دابەشی دەکرد، سەبارەت بە (أبوبکر)و (عوسمان) گوتراوە: کە زەکاتیان لە موچەخۆر گێڕاوەتەوە،[4] ئەمجا لە دوای کوژرانی (عوسمان) ناکۆکی لەسەر ئەمە دروست بوو: ئایا زەکات دەبێ هەر بدرێت بە والی‌و حوکمگێڕەکان یان نا؟[5]، هەڵبەتە ئەم پرسیارە لەسەر سامانە نادیارەکان ـی وەکو پارەو پوڵی شەخسی ـ دروست بوو، بەڵام سامانە دیارو

---

١ البينة (٥).

٢ المغني والشرح الكبير (٢/٤٣٤)، التطور الاقتصادي في العصر الأموي (ص: ٦٤).

٣ بدائع الصنائع في ترتيب الشرائع للكاساني، ك: الزكاة (٢/٨٢٠).

٤ الأموال لأبي عبيد القاسم بن سلام (ص: ٣٧٢، ٣٧٣).

٥ المصدر نفسه (ص: ٥٠٤ـ٥١١).

بەرچاوەکان ئەوە قسەی لەسەر نەبوو کە هەر دەوڵەت کۆی دەکردەوەو دابەشی دەکرد، ئیتر بە خاتری ئەوە لە سەردەمی (ئومەوی)دا خەڵکێکی زۆر هەقە زەکاتی ماڵی خۆیان نەدەدا بە والیەکان‌و بە ڕاوبۆچوونی خۆیان دابەشیان دەکرد، ئەمە سەری کێشا بۆ ئەوە داهاتی گشتی (زەکات) لە سەردەمی (ئومەوی)دا جگە لە سەردەمی (عومەری کوڕی عبدالعزیز) بە ڕادەیەکی بەرچاو دابەزێت، خەڵك بە گشتی سەرۆکایەتیکردنی (عمر)ی قبوڵ بووو بە پەلەو بێ دواکەوتن زەکاتیان بە دەوڵەتەکەی ئەو دەدا،[1] بە هەمان جۆر وەرگرتنی زەکات لە (موچە)ی کارمەندان دەستی پێکرایەوە،[2] واتە لە بنکەی دابەشکردنەکەدا بە ڕێژەی هەقە زەکاتەکە (کە دەکاتە لە ٢,٥٪) دەگێڕدرایەوە، بەم شێوەیە لە سەردەمی (عمری کوڕی عبدالعزیز)دا (زەکات) وەکو گرنگترین ڕەگەزی داهاتی گشتی دارایی دەوڵەت تەماشا دەکراو ڕۆڵی لایەنی بژێوی ژیانی کۆمەڵایەتی خەڵکی پێ دەگێڕدرا، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە بە درێژایی (چاخی ئومەوی) ئەم ڕۆڵە گرنگەی زەکات بە تەواوەتی پشتگوێ خرابێت، هەرچەندە ژمارەو حیساب لەسەر ئەمە دەست ناکەون، بەڵام تەواوی بەڵگەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە (دەوڵەتی ئومەوی) لە بواری ئابوریدا بایەخێکی یەجگار گەورەو گرنگی بە (زەکات) داوەو، بە تایبەتی لە ژێر سیستەمی (ڕێژەی دەیەکەکان)دا زەکاتی لە هەردو کەرتی سەرەکی کشتوکاڵی‌و بازرگانی وەرگرتووەو،[3] هەر لەم بوارەدا (دیوان)ێکی تایبەتی بە ناوی (دیوانی صەدەقات)ی دامەزراندووە،[4] کە بریتی بووە لەو دەزگایەی سەرپەرشتی کاروباری (زەکات‌و خێرو خێرات)ی دەکردو لە خەڵکانی سەرمایەدارو دەستڕۆیشتووی وەردەگرت‌و بەسەر ئەو پۆلە خەڵکانەیدا دابەش دەکرد کە قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەری ڕێزدار دیاریان کردوون،[5] (الجهشیاري) دەڵێت: لە سەردەمی خەلیفە (هوشامی کوڕی عبدالملك)دا (ئیسحاقی کوڕی ذوئەیب) سەرۆکی دیوانی (صەدەقات) بوو، لەبەر ئەوە تۆمارێك بۆ دیاریکردنی زەکاتە کۆکراوەو دابەشکراوە کە دانەنرابوو، ژمارەیەکمان لەسەر داهاتی زەکاتەکە دەست ناکەوێت، چونکە هەر هەمووی یان هەرە زۆری

---

١ عمر بن عبدالعزيز لإبن الجوزي (ص: ١٠٤)، التطور الإقتصادي (ص: ٦٥).

٢ الوثائق السياسية والإدارية العائدة للعصر الأموي (ص: ٤٢٦).

٣ الخراج (ص: ٢٧١، ٢٧٢).

٤ النظم الاسلامية، أنور الرفاعي (ص: ٨٢، ٨٣).

٥ الدواوين في العصر الأموي، نجم المسعودي (ص: ٦١).

دەستبەجێ بەسەر خەڵکانی موستەهەقدا دابەش دەکرا.[1] ئیدی بە شێوەیەکی گشتی دەکرێت بڵێین: سیستەمی (زەکات) لە سەردەمی (ئومەوی)دا بە گوێرەی ڕێنماکانی شەرع ڕێکخرابوو جێبەجێ دەکرا، لە سەردەمی (عومەری کوڕی عبدالعزیز)داو بە حوکمی ئەوە جێ متمانەی جەماوەر بوو جەماوەریش دەیەویست لە واقیعدا ئیسلام وەکو خۆی جێبەجێ بکات، بەرهەمو داهاتی زەکات لە (بیت المال)دا گەیشتە لوتکە، هەروەها دەرهێنانی زەکات لە موچەی خەڵك بە گشتیو فەرمانبەران بە تایبەتی.. ئەرکی سەرشانی دەوڵەتی سوککردو زیادبوونی داهاتەکان لەگەڵ کەمی ئەرککێشاندا گەشەسەندنێکی بەرچاوی لە بەرهەمی زەکاتدا دروستکرد.[2]

٢ـ سەرانە (الجزية):

بریتیە لەو سامانەی لە ئەهلی (ذمة) وردەگیرێت، سەرانەیەکە لەسەر خەڵکانی غەیرە دین بە هاتنەجێی مەرجەکانی سەریانەوە لە بەرانبەر پاسەوانیلێکردنیان دادەنرێت، ئیدی سەرانە لە ژێر ڕێنمایی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا یەکێك بوو لە داهاتە جێگیرەکانی دەوڵەتی (ئومەوی): ﴿ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلۡحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حَتَّىٰ يُعۡطُواْ ٱلۡجِزۡيَةَ عَن يَدٖ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ ۝٢٩ ﴾[3] واتە: بجەنگن لە دژی ئەوانە ی ئیمان بە خوداو دواڕۆژ ناهێننو، ئەوەی خوداو پێغەمبەرەکەی بە حەرامی دادەنێن ئەوان حەرامی ناکەنو، گەردن بۆ دینی هەق کەچ ناکەن لەوانەی —پێشدا— کتێبیان پێدراوە ، هەتا ئەو کاتە بە داماویو گەردنکەچی تەواوەوەو بەدەستی خۆیان سەرانە دەدەن، هەروەها لە سوننەتی پێغەمبەری خوداش (ﷺ)دا چەسپاوە، (موغیرەی کوڕی شوعبە) بە تەرجەمانی کاربەڕێوەبەری (کیسرا)ی گوت: پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرمانی پێکردووین هەتا ئەو کاتە خودا بە تەنها دەپەرستن، یان سەرانە دەدەن دەبێ جەنگتان لەگەڵ بکەین.[4] بە هەمان چەشن بە بەڵگەی (ئیجماع)یش چەسپاوە.[5] سەبارەت بە

---

١ التطور الإقتصادي في العصر الأموي (ص: ٦٦).

٢ المصدر نفسه (ص: ٦٦).

٣ التوبة (٢٩).

٤ فتح الباري (٦/٣١٧).

٥ المغني، ك: الجزية (١٠/٥٦٧).

ڕێکخستنی سیستەمی (سەرانە) ئومەویەکان هیچ شتێکی زیادیان دانەهێناوە، دەکرێ بڵێین: وەرگرتنی سەرانە بە پێی ئەو سیستەمەی (عومەری کوڕی خەتتاب) (خـودا لێـی ڕازی بێـت) ڕێکـی خـستبوو بـەم شـێوازە بـەڕێوە دەچـوو: یەکـەم: دیـاریکردنی ئـەو جـۆرە کەسـانەی سـەرانەیان لێ دەسـەنرێت: کـە خۆیـان لـە نێرینـەی ئاقـڵ‌و باڵغـدا نیـشان دەدا.[1] دووەم: دیاریکردنی ئەو جۆرە کەسانەیان کە چاوپۆشیان لێ دەکرێت، کە خۆیان لە چـینی منـداڵان‌و ژن‌و نەخۆشانی درێژخایەن‌و کۆیلەو شێت‌و کوێرو پیرو ڕەبەندا نیـشان دەداو هـیچ داهاتێـك بەدەست ناخەن.[2] سێیەم: چاودێریکردنی ئاستی پاشەکەوتکردنی بەرهەمهێنـەر، بـە جۆرێـك دەبێ دەوڵەمەند ساڵانە (٤٨) درهەم بداتو، مامناوەند (٢٤) درهـەم بـدات‌و کەسـانی ئاسـت نزمیش بەو مەرجەی ئیشیان بە دەستەوە بێـت (١٢) درهـەم بـدەن.[3] چـوارەم: پـۆلێنکردنی سەرانە بە پێی ئەم دوو پێوەرە دەبێت:

أـ پێوەری بەرپرسیارێتی: بەسەر (تاك)و (کۆمـەڵ)دا دابـەش دەبێـت، سـەرانەی تـاکی: بریتیە لەو بڕە پارە دیاریکراوەی لەسەر بابای (ذمي)و بەپێی هاتنەجێی مەرجەکانی سەرانە بەسەریدا دادەنرێت‌و لەگەڵ موسڵمان بوونی لەسەری لادەچێت، بـەڵام سـەرانەی (جـەماعی) یان سـەرانەی (هاوبـەش): بریتیـە لـەو بـڕە پـارە دیـاریکراوەی لەسـەر خـەڵکی شـارێك یـان گوندێك دادەنرێت‌و ئەمجا خۆیان لەنێو خۆیاندا سەرپەرشـتی کۆکردنـەوەی دەکـەن‌و دیـاری دەکەن کە هەر کەسێکیان چەندەی بەردەکەوێت بیدا، وێنەی ئەمە: پێغەمبەری خـودا (ﷺ) ئاشتی لەگەڵ خـەڵکی (الأذرح) ئەنجامـداو بـڕی سـەد (١٠٠) دینـار سـەرانەی لەسـەر دانـان‌و دەبوایـە سـاڵانە لـە مـانگی (ڕەجـەب)دا بیـدەن،[4] ئیـدی بـە زۆری سـەرانە لەسـەردەمی (ئومەوی)یدا لەم جۆرە بوو.[5]

ب ـ پێوەری نەقدی‌و عەینی:

بەپێی ئەمە سەرانە دەبوە سـێ بـەش: سـەرانەی نەقـدی، سـەرانەی عـەینی، سـەرانەی هاوبەش. ئیدی لە سەردەمی (ئومەوی)دا هەموو ئەم جۆرانە وەردەگیران‌و هیچ بەڵگەیەکیش

١ التطور الإقتصادي في العصر الأموي (ص: ٦٦).
٢ الأحكام السلطانية (ص: ١٤٤).
٣ التطور الإقتصادي في العصر الأموي (ص: ٦٧).
٤ فتوح البلدان للبلاذري (ص: ٧١).
٥ التطور الإقتصادي في العصر الأموي (ص: ٦٧).

لەبەدەستدا نیە ئاماژە بدا كە لەم سیستەمە دەرچوويێت، بە تایبەتی كە سەریعەتی ئیسلامی داخوازی پابەندبوونو وەفاداری بە بەندەكانی گرێبەستی ئاشتیەوە دەكات، بەلاَم ئەمە نابێتە بەربەست لە بەرانبەر ئەوەدا كە جاروبارە هەندێك لە والیەكان سنووریان بەزاندبێتو لە ڕێنما شەرعیەكان دەرچووبن.[١] سەبارەت بە دیاریكردنی قەبارەو ڕێژەی تێكڕای گشتی ئەو سەرانەیەی كە دەست دەوڵەت دەكەوت لە ساڵێكدا، كارێكی قورسە، بەلاَم لێرەدا بەلگەگەلێك هەنو ئاماژە بە گەورەو گرنگی قەبارەی داهاتی سەرانەی ئەو سەردەمە دەدەنو دەری دەخەن كە دەوڵەتی (ئومەوی) چ ڕۆڵێكی گەورەو گرانی لە بلاَوكردنەوەی ئیسلامو گەیاندنی بە شارو ولاَتانێكی زۆردا گێڕاوەو دوای فەتحكرانیان سەرانەی لەسەر ئەو كەسانە داناوە كە موسلّمان نەبوون.[٢]

٣ـ خەراج:

پێشەنگایەتی ڕێكخستنی سیستەمی ئەم داهاتەش وەكو تەواوی سەرچاوە داراییەكانی تر بەر (عومەری كوڕی خەتتاب) (خودا لێی ڕازی بێت) كەوتووە، دەوڵەتی (ئومەوی) سودێكی زۆری لەم سیستەمە وەرگرتو، لە زۆربەی زۆری هەرێمەكاندا پەیڕەوی لێكرد، ئەمە جگە لە هەندێك هەمواركردن (تعدیلات) كە لەمەولا دەخرێتەڕوو.[٣] (خەراج) پێناسەیەكی تایبەتی هەیە: كە بریتیە لە داهاتی ئەو زەویانەی موسلّمانان بە جەنگ فەتحیان كردوونو، (ئیمام) بە خاتری بەرژەوەندی درێژخایەنی موسلّمانان وەقفی كردوون، (عمر) دوای فەتحكردنیان، زەویەكانی (سەواد)ی (عێراقو شام)ی وەقفی موسلّمانان كردن،[٤] وەكو (إبن رجب الحنبلی) دەڵێت: (خەراج) لەگەڵ نرخو كرێ بەرانبەر ناكرێت، بەڵكو خۆی لە خۆیدا ئەسلّێكی خاوەن ڕەگوڕیشەی چەسپاوەو بە شتی تر قیاس ناكرێت.[٥] ئەمەو داهاتی خەراج بە نیسبەت (دەوڵەتی ئومەوی)یەوە بایەخێكی یەجگار گرنگی هەبوو، ئەگەر داهاتی خەراجی ڕەشەخاكی عێراق لە سەردەمی ویلایەتی (عبیدالله ی كوڕی زیاد) ٥٤ــ٦٦ك بە نموونە وەربگرین دەبینین خۆی لە (١٣٥) ملیۆن درهەم داوە،[٦] بەلاَم سەبارەت بە

---

١ المصدر نفسه (ص: ٦٨)،، تأريخ بلاد الشام في العصر الأموي (ص: ٣٩٤).

٢ التطور الإقتصادي في العصر الأموي (ص: ٧١).

٣ المصدر نفسه (ص: ٧٣).

٤ الخراج لأبي يوسف (ص: ٢٤ــ ٢٥)، إقتصاديات الحرب (ص: ٢١٥).

٥ الإستخراج لأحكام الخراج (ص: ٤٠)، إقتصاديات الحرب (ص: ٢١٥).

٦ الأحكام السلطانية (ص: ١٧٥)، التطور الإقتصادي في العصر الأموي (ص: ٧٤).

ناوچەکانی (جزیرە)و (شام) بەپێی ئەو سیستەمەی (معاویە) دایناپوو لەسەر خەڵکی شارەکانی واجب کردبوو بە یەکێك لەم دوو ڕێیە (سەرانە) یان (خەڕاج) سەروەتو سامان پێشکەش بە (بیت المال) بکەن:

أ ـ دەبێت دانیشتوانی (قنسرین) ساڵانە دوو ملیۆنو نیو درهەم پێشکەش بکەن.

ب ـ دەبێ دانیشتوانی (ئوردون) ساڵانە شەش هەزار درهەم بدەن.

ج ـ دەبێ (فەلەستین) نزیکەی شەش هەزار درهەم بدات.[1]

بە چەند شێوەیەك لە بەدەستهێنانی (خەڕاج)دا هەندێك لادان هاتە ئاراوە، گرنگترینیان:

... دانانی (خەڕاج) لەسەر ئەو زەویانەی کە بە دەقی گرێبەستی ئاشتی هەڵاوێردرابوون،[2] ئەمە لەسەردەمی (یەزیدی کوڕی معاویە) (٦٠ــ٦٤ك) ڕوویداو لە (ئوردون)و (فەلەستین)خەڕاجی لەسەر زەویەکانی (سامرە)[3] دانا.

.... بەکارهێنانی توندوتیژی لە بەدەستهێنانی (خەڕاج)دا، ئەمەو بە هەڵاواردنی سەردەمی (عومەری کوڕی عبدالعزیز) لە هەندێك ناوچەداو لە کاتی بەدەستهێنانو گردکردنەوەی داهاتە جۆراوجۆرەکاندا توندوتیژی بەکاردەهێنرا.[4]

.... دانانی کرێی وەرگرتنو کۆکردنەوەی (خەڕاج) لەسەر بابای بەرهەمهێنەر وەکو کێشانی خەرجی ئەو کاغەزانەی ئەندازەی (خەڕاج)ەکەی لەسەر دەنوسرا، کرێی ئەو کۆگایەی دەغڵو دانو بەرهەمەکەی (خەڕاج)ی تێدا هەڵدەگیرا، کرێی ئەو کەسەی داهاتی (خەڕاج)ەکە کۆدەکاتەوەو، ئیدی تەواوی ئەو کرێیانەی دەچوونە سەر داهاتی (خەڕاج) دەچوونە ئەستۆی بەرهەمهێنەر.[5] ئەمەی باسکرا بەر لە هاتنی سەردەمی (عومەری کوڕی عبدالعزیز) پەیڕەوی لێکراو، بە هاتنی ئەو نەهێڵراو بە کۆچی دوایشی دەستی پێکرایەوە.[6]

(خەڕاج) لە سەردەمی (ئومەوی)دا دیوانێکی تایبەت بە خۆی هەبوو (دیوانی خەڕاج)ی پێ دەگوترا: کە بریتی بوو لەو دەزگایەی سەرپەرشتی وەرگرتنی داهاتی (خەڕاج)ی

---

١ التطور الإقتصادي في العصر الأموي (ص: ٧٦).

٢ فتوح البلدان (ص: ١٦٢، ١٦٣).

٣ (السامرة): هۆزێکی جوولەکەنو بەسەر دوو تیرەدا بە ناوی (دەستانو کوشان)دا دابەش بوون، التطور الإقتصادي في العصر الأموي (ص: ٧٦).

٤ الخراج لأبي يوسف (ص: ٢٦٩، ٢٧٠).

٥ المصدر نفسه (ص: ١٨٦، ١٨٧)، التطور الإقتصادي في العصر الأموي (ص: ٧٨).

٦ الوثائق السياسية والإدارية العائدة للعصر الأموي (ص: ٤٥٦).

دەکردو، بە حوکمی ئەوە بەرفراوانترین داهاتی دەوڵەت بوو، کۆی دەکردەوەو تۆماری دەکردو خەمڵاندنی لەسەر ئەنجام دەدا،[١] ئەمەو (ئومەویەکان) دەسەڵاتی (جبایەت) -واتە وەرگرتن‌و کۆکردنەوەی داهاتیان- لە دەسەڵاتی (ویلایەت) جیاکردەوەو لە هەر هەرێمێکدا لێپرسراوێکی تایبەتیان بۆ دیاریکرد، سەرچاوەکان لیستی ئەو ناوانەیان هێناون کە ئەرکی کۆکردنەوەی داهاتەکانیان خراوەتە ئەستۆو سەرپەرشتی کاروباری دیوانی (خەراج)یان کردووە، معاویە (خودا لێی ڕازی بێت) (سرجون ی کوڕی منصور)ی کردە بەرپرسیاری (خەراج)ی (دیمەشق)[٢]و، (سلیمانی مشجعی) بەسەر (خەراج)ی (فەلەستین)ەوە دانا[٣]و، (إبن أثالی نصراني)یشی (خەراج)ی (حمص)ەوە دانا،[٤] (سرجونی کوڕی منصور) لە سەردەمی (یەزیدی کوڕی معاویە)دا لەسەر کاروباری دیوان بەردەوام بوو، بە درێژایی حکومەتی (معاویەی دووەم)و (مەڕوانی کوڕی حەکەم)و (عبدالملك) تا ڕۆژی لێخرانی لەسەر ئەم کارەی بەردەوام بوو.[٥] معاویە (خودا لێی ڕازی بێت) لە ڕێی والیەکانیەوە بایەخێکی زۆری بە خاك‌و زەوی‌و زارە کشتوکاڵیەکاندا، خاکی قامیشەڵانی هۆڕەکان (البطائح)ی عێراق کە سێڵاو بەسەری گەڕابوو و خراپی کردبوو، بڕیاری چاککردنەوەی داو قامیشەکانی بڕین‌و بەنداوی بۆ دروستکردن‌و خاکەکەی ژیاندەوەو داهاتی گشتی بە ئەندازەی پێنج هەزار هەزار (واتە پێنج ملیۆن) درهەم بەرەوسەر ڕۆیشت‌و، ئیدی معاویە چاودێری بارودۆخی دانیشتوانی کردو بە ئەنجامدانی چەند کارو چالاکیەك کە هەندێکیان پەیوەندیان بە خودی داهاتی (خەراج)ەوە هەبوو، هەندێکی تریشیان پەیوەست بوون بەو کەسانەی کاروباری (خەراج) بەڕێوەدەبەن، بەڵێ بەم کارو چالاکیانەی هەوڵیدا دانیشتوان دڵنیا بکات‌و باری سەر شانیان لە پەیداکردنی بژێوی ژیان‌و گوزەرانیان سوك بکات.[٦] لە لایەکی ترەوە بە خاتری بەکارهێنانی سیفەتی دادپەروەری‌و ویژدان لە بەرانبەر ئەو خەڵکانەدا کە ماڵیاتی (خەراج) دەدەن بە دەوڵەت، کارمەندی دادپەروەرو بە ویژدانی دیاری دەکردن، ئەگەر خزمی هەرە

---

١ إدارة بلاد الشام في العهدين الراشدي والأموي (ص: ١٧٧).

٢ الجهشياري (ص: ٢٤).

٣ الجهشياري (ص: ٢٦)، إدارة بلاد الشام (ص: ١٧٨).

٤ تأريخ اليعقوبي (٢/٢٢٣).

٥ إدارة بلاد الشام في العهد الراشدي والأموي (ص: ١٧٨).

٦ الخراج، د. غيداء خزانة كاتبي (ص: ٢٣٩).

نزیکیشی بوونایە چاودێری دەخستنەسەر، (عبدالرحمن ی کوڕی عبدالله ی ثقفـي) کـوڕی (أم الحکم)ی خوشکی بوو، بە حوکمی ئەوە لە مەسەلەی (خەڕاج)دا توندو سەختگیر بوو، لەسەر کـاری لاداو، لـە هـیچ کارمەنـدێکی خـۆی قبـوڵ نـەدەکرد پـێش وادە داهـاتی (خـەڕاج) وەربگرێت.[١] لە سەردەمی (ئومەوی)دا کارمەندی زۆری غەیرە عەرەب لە دیوانی (خـەڕاج)داو بە حوکمی چەند هۆکارێك کە (زیاد بن أبیه) بە ڕوونی باسی لێـوە کـردوون دامـەزرێنرابوون، هەڵبەتە شارەزابوونیان بە کاروباری (خەڕاج)و ڕۆڵگێڕانی بەرچـاویان لـە ژیاندنـەوەی زەوی‌و کـشتکردنیدا[٢] دوو هۆکـاری سـەرەکی ئـەم دامەزراندنـەیان بـوون لـە لایـەن دەوڵـەتی (ئومەوی)یەوە، (زیاد) دەڵێـت: پێویـستە کاتیبـانی (خـەڕاج) ئـەو میرعەجەمانـە بـن کـە لـە کاروبـاری (خـەڕاج)دا شـارەزان،[٣] هـەروەها (زیـاد) داوای دەکـرد ڕێـز لـە جوتیـاران‌و سەرۆکەکانیان بگیرێت‌و چاکەیان لەگەڵدا بکرێت، دەیگوت: چاکە لەگەڵ جوتیارەکان بکـەن، هەتا ئەوان قەڵەو بن ئێوەش تێروپڕ دەبن.[٤]

٤ـ ڕێژەی دەیی (العشور):

بریتی بوو لەو پارەو سامانەی لەبەرانبەر ئەو کالاّ بازرگانیانە وەردەگیرا کـە بـە شـێوەی دەرچوون‌و هاتن بەسەر سنووری وڵاتی ئیسلامدا گوزەریـان دەکـرد، ئەمـە زیـاتر بـە بـاجی گـومرگی سـەردەمی ئێـستا دەچـوو، ئـەو کارمەنـدەی ئـەم جـۆرە داهاتـەی وەردەگـرت‌و کۆدەکردەوە پێی دەوترا: (العاشر) (وەرگری ڕێژەی دەیـی)، چـونکە ڕێـژەی دەیـی داهـاتی وەردەگرت.[٥] یەکەمین کەس ئەم سیستەمەی لە ئیسلامدا داهێنـا (عومـەری کـوڕی خـەتتاب) (خودا لێی ڕازی بێت) بوو، ڕێژەی دەیەکی لەسەر داهاتی کافری حەربی دانا، ڕێژەی نیـوەی دەیـەکی لەسـەر داهـاتی کـافری (ذمـي) دانـا، ڕێـژەی چـارەکی دەیـەکی لەسـەر داهـاتی موسڵمانان دانا.[٦]

---

١ المصدر نفسه (ص: ٢٣٩).

٢ المصدر نفسه (ص: ٢٦٢).

٣ المصدر نفسه (ص: ٢٦٢).

٤ الضرائب في السواد في العصر الأموي، للدوري (ص: ٤٨)، الخراج (ص: ٢٦٣).

٥ الخراج لأبي يوسف (ص: ٢٧١)، إقتصاديات الحرب (ص: ٢٢٣).

٦ الأموال لأبي عبيد (ص: ٤٧٥، ٤٧٦).

ئەم سیستەمە بە گوێرەی ئەم ڕێسایانەی خوارەوە لە سەردەمی (ئومەوی)دا بەردەوام بوو:

أ- دانانی سنوورێك بۆ ئاستی نزمی کاڵای بازرگان بە مەبەستی چاوپۆشی لێکردنی، بە نیسبەت موسڵمانەوە بە (٢٠٠) دوو سەد درهەم دانرا،[١] بە نیسبەت کافری (جەنگی)و (ذمي) ڕای جیاوازی لەسەر دروست بوو.[٢]

ب - لە ساڵدا تەنها جارێك وەردەگیرێت.

ج - بە نیسبەت سامانی ئاژەڵی بابای موسڵمانەوە، دەبێ لە پاوانی گشتی لە لەوەڕابێت.

د- ئەم داهاتە لە کۆیلەو کۆیلەیەك خۆی بۆ خۆکڕینەوە سازکردبێت، هەروەها لە باجوەرگرو ئەمینداری کاڵای خەڵکی وەرناگیرێت، بەڵکو لە خودی خاوەن ماڵ وەردەگیرێت.[٣]

هـ - دەبێ بەڵگەنامەیەك بدرێتە بازرگانو بڕی ئەو پارەی داویەتی بنووسرێت: تا ساڵی ئاییندە دەیەکی لێ وەرناگیرێت.[٤]

و- بازرگان ناپشکنرێتو توندوتیژی لەگەڵ بەکارناهێنرێت.[٥]

ز- هەر کەسێك پڕوپاگەندە بۆ دۆخی قەرزداری خۆی بکاتو بڵێ کاڵا بازرگانیەکانم قەرز دەیانخوات ئەگەر موسڵمان بێت بڕوای پێ دەکرێت، ئەگەر گومان کەوتە سەر ڕاستی قسەکەی لەسەر ڕای هەندێك زانا سوێند دەدرێت.[٦] بەڵام بابای (ذمي) بە گوێرەی پەسەندترین ڕا دەبێ دوو موسڵمان شایەدی بۆ بدەن، ئەمجا چاوپۆشی لێ دەکرێت.[٧]

ح - ئەو دەیەکەی لە موسڵمانان وەردەگیرێت بریتیە لە (زەکات): لە ساڵێکدا (زەکات)و (دەیەك) بە جوتە لە موسڵمان وەرناگیرێت.[٨]

---

١ الخراج لأبي يوسف (ص: ٢٧٦).
٢ الأموال لأبي عبيد (ص: ٤٧٧).
٣ الخراج لأبي يوسف (ص: ٢٧٤).
٤ الأموال لأبي عبيد (ص: ٤٧٥)، التطور الإقتصادي (ص: ٨٠).
٥ الخراج لأبي يوسف (ص: ٢٧٥)، التطور الإقتصادي (ص: ٨٠).
٦ الأموال لأبي عبيد (ص: ٤٨٠، ٤٨١).
٧ الأموال لأبي عبيد (ص: ٤٧٩)، التطور الإقتصادي (ص: ٨٠).
٨ الخراج (ص: ٢٧٣).

ط ـــ ئەگەر ناموسڵمان بارەکەی بریتی بوو لە سامانێکی وەکو (مەی)و (بەران)و هاوێنەکانیان‌و لە لای موسڵمانان بە (ماڵ) دانەدەنران، خەڵکانێکی ناموسڵمان دەیقەبڵێنن‌و نرخی لەسەر دادەنێن‌و نرخەکەی لەگەڵ بەهای ئەو کالا بازرگانیەی پێیەتی کۆدەکرێتەوەو دەیەکەکەی لەسەر هەمووی لێ وەردەگیرێت.[١]

لێرەدا بەڵگەی زۆر هەن ئاماژە دەدەن کە دەیەك بەشێکی گەورەی داهاتی دەوڵەتی پێکهێناوە، کاتێك (عبدالله ی کوڕی زوبێر) ماوەی ساڵێك نەیهێشت داهاتی دەیەك وەرگیرێت، دارایی دەوڵەتەکەی شکستی خوارد، ئەمە وای لێکرد لەم بڕیارە پەشیمان بێتەوە.[٢]

٥ـ تەرخانکراو (الصوافي):

بریتیە لەو پارچە زەویە کشتوکاڵیەی لە جەنگی بێ کوشتارو بە شێوەی (فيء) دەستکەوتووەو پاشان (ئیمام) بەو شێوەیەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەنجامی دا بۆ (بیت المال)ی تەرخان دەکات، یان پارچە زەویەکی ئەو وڵاتانەیە کە بە شەڕو کوشتار فەتحکراون‌و پاشان بە سیستەمی پێنجیەك یان بە بەخشین لە لایەن جەنگاوەرانی خاوەن دەستکەوتەوە پێشکەش بە (بیت المال) دەکرێت، ئەمەی دوایی (عومەری کوڕی خەتاب) ئەنجامی دا،[٣].... ئەمجا دەخرایە بەردەستی کەسێك بتوانێت کشتی بکات‌و ڕەنێوی بێنێ‌و مافی (بیت المال)یش بدات، یەکەمین کەس کە زەوی (بیت المال)ی تەحویلی جوتیار یان کشتیار دا (عوسمانی کوڕی عەففان) (خودا لێی ڕازی بێت) بوو،[٤] ئەو بە مەبەستی بەرهەمهێنانی زەویەکەو زیادکردنی داهاتی ئەم کارەی ئەنجامداو مەرجی دانا کە دەبێ مافی (فيء) واتە دەستکەوتی (بیت المال)ی لێ بدات،[٥] ئەمەو داهاتەکەی لەو کاتەدا خۆی لە پێنج ملیۆن درهەم دا.[٦]

(معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان) زوو سەبارەت بەمە بە ئاگا هات‌و، نامەی بۆ (عوسمان)ی (خەلیفە) نووسی: لەو خاکە بە پیتە تەرخانکراوانەی (بیت المال)ی تەحویلداو خۆی پێ

---

١ الخراج لأبي يوسف (ص: ٢٧٣).
٢ التطور الإقتصادي في العصر الأموي (ص: ٨٠).
٣ الأحكام السلطانية (ص: ١٩٢).
٤ فتوح البلدان (ص: ٢٧٣).
٥ الأحكام السلطانية (ص: ١٩٣).
٦ الأحكام السلطانية (ص: ١٩٣).

بەهێز بکات، (إبن عساکر) دەڵێت: تا ئەوەی (معاویە) لە سەردەمی ویلایەتیکردنی شامدا بۆ (عوسمان)ی نوسی کە ئەو موچەی لە بەرانبەر کارەکەیدا بۆی بڕیوەتەوە بەشی ژیان‌و میوانداریەکانی لە وەفدە سەربازیەکانی‌و نوێنەری میرەکانی‌و هەموو ئەوانەش کە بە وەفد لە (ڕۆم)ڕا دێنە لای ناکات، ئەمەو لە نامەکەیدا ناوی ئەو پارچە زەویە (صوافی)یانەی هێنابوو داوای لێکردبوو کە تەحویلی ئەویان بداتو بەمە خۆیان پێ بەهێز بکات، بۆشی ڕوون کردبۆوە کە ئەم پارچە زەویانە نە لە بازنەی گوندەکانی (ئەهلی ذمة)دان‌و نە دەشکەونە سنووری زەویەکانی (خەراج)ەوە، ئەمەو (عوسمان) سەبارەت بەمە نامەیەکی بۆ نوسیەوە،[1] وێڕای ئەمەش زەوی‌و زاری بنەماڵەی (بنی قوقا)ی بێ پاشەواریش دەخرێنە سەر ئەو زەوی‌و زارانەوە،[2] کاتێك معاویە جڵەوی کاروباری بە دەستەوەگرت ئەم زەوی‌و زارانەی لەسەر هەژارانی موسڵمانان بە تایبەتی خزمە هەژارەکانی وەقف کردن،[3] مێژوونووسی شیعە مەزەب (الیعقوبی) ئاماژە دەدات کە: معاویە لەگەڵ گرتنی جڵەوی دەسەڵات ئەو زەوی‌و زارو مەزرا کشتوکاڵیانەی (شام‌و جزیرەو یەمەن‌و عێراق)ی تایبەت کردن بە خودی خۆیەوە،[4] هەندێکی بۆ خزمە هەژارەکانی‌و کەسە تایبەتەکانی دابڕین‌و بەم شێوەیە: ئەو لەسەرتاسەری دونیادا بە یەکەمین کەس دادەنرێت کە زەویە (صوافی)یەکانی خستبنە بەردەستی خۆی‌و کشتی کردبن.[5]

ئاماژەکەی (الیعقوبی) بە ئاشکرایی تێکەڵکردنێکی لەخۆ گرتووەو پێویستە ئاوڕێکی لێ بدرێتەوە، باسی پارچە زەوی (صوافی) (جزیرە)و (یەمەن) دەکات، وەکو زانراوە (عومەری کوڕی خەتتاب) (خودا لێی ڕازی بێت) چەند پارچە زەویەکی کشتوکاڵی لە ڕەشەخاکی (عێراق)و (شام) هەڵبژاردن‌و تایبەتی کردن بە (بیت المال)ەوە، بەڵام لە خاکی (جزیرە)و (یەمەن)دا ئەم زەویانەی دیاری نەکردوون.[6] هەروەها (الیعقوبی) ئاماژە دەدا کە معاویە ئەم زەوی‌و زارانەی تایبەت کردون بە خودی خۆیەوەو هەندێکی بەسەر خزمە نزیکەکانی‌و کەسە تایبەتەکانیدا دابەش کردوون، ئەگەر بەراوردێك لە نێوان ئەم دەقەو هەمان دەقی (إبن

١ تهذيب تأريخ دمشق (١/١٨٤)، الخراج، د. غيداء (ص: ٣٠٧).

٢ الخراج، د. غيداء (ص: ٣٠٧).

٣ تهذيب تأريخ دمشق (١/٨٤)، الخراج، د. غيداء (ص: ٣٠٧).

٤ تأريخ اليعقوبي (٢/٢٣٢، ٢٣٤).

٥ تأريخ اليعقوبي (٢/٢٣٤).

٦ المعرفة والتأريخ (١/٤٣٤)، الخراج، د. غيداء (ص: ٣٠٧).

عساکر)دا بکەین، بۆمان دەردەکەوێت کە (الیعقوبی) چەندە زۆری تێپەڕاندووە، (إبن عساکر) سەبارەت بەم زەویانە دەڵێت: ئەم زەویانە هەتا کوژرانی (عوسمان)و بە دەست خودی (معاویە)وە بوون، کاتێك جڵەوی حوکمی گرتە دەست وەکو خۆی هێشتنەوە، ئەمجا هاتو لەسەر موسڵمانان‌و خزمە هەژارەکانی (وەقف) کردن، واتە معاویە لە سەرەتا-ی کاریدا- دەستکاری نەکردن، بەڵکو لەسەر حاڵەتی پێشوی هێشتنەوە،[١] بەلام وەکو دیارە لە بارودۆخی ئەو کاتی (شام)دا پێداویستگەلێکی سیاسی سەریان هەڵداوەو وایان لە دەوڵەت کردووە شێوازێکی تازەی ڕێکخستن لە هەوڵ‌و تەقالاکانیاندا بگرنەبەرو بەم جۆرە خزمەتی بەرژەوەندیەکانی دەوڵەت بکەن، یەکێك لەو پێداویستیانە: هەوڵدان بۆ دروستکردنی هاوسەنگی لە نێوان هەردوو هۆزی (یەمانیە)و (قەیسیە)ی (شام) کە دوو پێکهێنەری گەورەی ئەو وڵاتە بوون، بە خاتری پێکانی ئەم ئامانجە (معاویە) مەزرای بەرفراوانی دادەبڕین‌و بەسەر خەڵکیدا دابەش دەکردن،[٢] ئیدی ویستراوە ئەم کردارەی معاویە بە خراپی لە خەڵك بگەیەنرێت، هەندێك مێژوونووسی وەك (الیعقوبی) بابەتی (بەرژەوەندی دەوڵەت)یان بە (بەرژەوەندی خانەوادەی ئومەوی)و بە تایبەتیش (بەرژەوەندی خودی معاویە) تەفسیر کردووە،[٣] هیچ گومانی تێدا نیە کە معاویە ئەم داهاتەی بۆ جێگیرکردنی (پایەکانی دەوڵەت)و پاراستنی (یەکێتی ئوممەت)و جێبەجێکردنی داخوازیەکانی (بەرژەوەندی گشتی) بەکارهێناوە،[٤] ئیتر دوای ئەمە هیچ بەربەستێکی (شەرعی)یش لە ئارادا نەبووە تا خێرو چاکە لە بەرانبەر خێزان‌و خزم‌و کەسە تایبەتەکانی خۆیدا بنوێنێت، ئەمەو معاویە فەرمانیدا جارێکی تر پێوانە (مەسح)ی مەزرا (صوافی)یەکانی وڵاتانی دەوڵەتی (ئومەوی) بکرێتەوەو دوای دەستبەسەرداگرتنی تۆماری زەوی‌و زارو موڵکەکانی (دەوڵەتی ساسانی) زەوی‌و زارێکی یەجگار بەرفراوانی خستە سەر زەوی‌و زارە (صوافی)یەکانی دەوڵەت[٥]و، ڕاستەوخۆ کەوتنە ژێر دەستی خۆیەوەو هەندێك لە ناتەواویەکانی خەرجیە گشتیەکانی پێ تەواو دەکردن، ئەمەو داهاتی زەویە (صوافی)یەکانی (عێراق)و دەوروبەریان خۆی گەیاندە بەهای

---

١ الخراج، د. غیداء (ص: ٣٠٨).

٢ الخراج، د. غیداء (ص: ٣٠٨).

٣ الخراج، د. غیداء (ص: ٣٠٩)، دراسات في الحضارات الاسلام (ص: ٤٦).

٤ الخراج (ص: ٣١١)، غیداء خزنة کاتبي.

٥ الخراج (ص: ٣١١)، غیداء خزنة کاتبي.

(سەد ملیۆن) درهەم.[١] هەمان جۆرە سیاسەتی لە بەرانبەر زەوی‌و زارە (صوافی)یەكانی وڵاتی (شام)و (جزیرە)و (یەمەن) ئەنجامداو، (فەدەك)یشی بۆ خودی خۆی تەرخانكرد، دوای ئەمە بە بەش دای بە (مەڕوانی كوڕی حەكەم) تاڕەنێوی بێنێ،[٢] ئیدی بە درێژایی ماوەی حوكمەتی (ئومەوی) جگە لە سەردەمی (عومەری كوڕی عبدالعزیز) بەم شێوەیەكاریان لەسەر دەكرا، (عومەری كوڕی عبدالعزیز) ئەم زەویە (صوافی)یانەی خستنەوە سەر (موڵكایەتی گشتی)و هانی (كەرتی تایبەت)ی دەدا كشتیان بكەن‌و ڕەنێویان بێنن،[٣] بە هەمان شێوە زەوی‌و زاری (فەدەك)ی بۆ (بیت المال) گێڕایەوەو بە دەستوری پێغەمبەری خودا (ﷺ)و خەلیفە ڕاشیدەكان بەرهەم‌و داهاتەكەی بۆ ڕێبواران خەرج دەكرد.[٤] هەروەها نامەی بۆ والی (عێراق) نووسی‌و فەرمانی پێكرد زەویە (صوافی)یەكان بە بەرهەم بێنێت، نوسیبووی: تەماشاكە لە پێش ئێوەدا چەند زەوی‌و زاری (صوافی)یەكان هەبوون، هەتا دەگاتە (دەیەك)یش بیاندەنێ، ئەگەر هەر كەس نەبوو كشتیان بكات، بە بەلاش بیانبەخشن، ئەگەر هەر نەچێنران ئەوا پارەی (بیت المال)یان لێ خەرج بكەن‌و كشتیان بكەن‌و هیچ پارچە زەویەك بە بەیاری مەهێڵنەوە.[٥]

لەم (دەقەدا) بۆمان ڕوون دەبێتەوە، كە (عومەری كوڕی عبدالعزیز) چەندەی بایەخ بە زەوی‌و زارە (صوافی)یەكان داوە، ئەمە خۆی لە خۆیدا بەڵگەیە بۆ (عمر) كە گرنگی بە سەرچاوەكانی (داهاتی دەوڵەت) داوە، بەڵام دوابەدوای گوزەركردنی سەردەمی (عمری كوڕی عبدالعزیز) كاروباری زەویە (صوافی)یەكان وەكو پێش سەردەمەكەی ئەویان لێكرایەوە.[٦]

٦ـ پێنجیەكی دەستكەوتەكان (خمس الغنائم):

(غەنیمەت=دەستكەوت): بریتیە لەو سەروەت‌و سامانەی موسڵمانان لە جەنگی سەختگیری گەڵ كافراندا زەوتیان كردووە.[٧] قورئانی پیرۆزیش باسی لێوە كردووە،

---

١ الادارة في العصر الأموي، نجد خماش.

٢ فتوح البلدان (ص: ٤٦).

٣ فتوح البلدان (ص: ٤٦)، التطور الاقتصادي في العصر الأموي (ص: ٨٢)..

٤ فتوح البلدان (ص: ٢٤، ٤٨).

٥ واسط في العصر الأموي (ص: ٤٠٦).

٦ التطور الاقتصادي في العصر الأموي (ص: ٨٤).

٧ الخراج، يحيى القرشي (ص: ٥٨).

بزوتنەوەی (فتوحات) لە سەردەمی (ئومەوی)دا چالاکی زۆری هەبوونو بەمەش دەستکەوتە جەنگیەکان وەکو یەکێك لە داهاتەکانی (بیت المال) زیادیان کرد، ئومەویەکان سەبارەت بە دەستکەوتەکانو زەویو زارە فەتحکراوەکان هەمان پەیڕەوی (عمری کوڕی خەتاب)یان گرتەبەر، ئەمەو دەستکەوتەکان پێنجیەکیان بۆ (بیت المال) لێ دەردەهێنراو، ئەوەی دەمایەوە بەسەر جەنگاوەرەکاندا دابەش دەکراو، زەویو زارە فەتحکراوەکانیش وەکو دەستکەوتی (فيء) دوابەدوای لەسەردانانی باجی (خەراج) بۆ (کۆمەڵی موسڵمانان) تەرخان دەکران.[1]

ئەمانەی باسیان لێوەکرا گرنگترین سەرچاوەی دارایی دەوڵەتی (ئومەوی) بوون، لەگەڵ هەبوونی چەند سەرچاوەیەکی تری وەکو پێنجیەکی (الركان): کە بە سامانی شاراوەی وەکو خەزنە یان کانزا دەناسرێت، هەروەها: (سامانی میراتی کەسێکی بێ پاشەوارو وەجاخ کوێر). ئیدی سەرچاوەکانی دارایی سەردەمی ئومەوی وەکو هی سەردەمی پێغەمبەری خودا (ﷺ)و خەلیفە ڕاشیدەکان وەکو خۆیان مانەوەو لەگەڵ ئەوەدا ئەم دوو سەچاوەی دوایە لە سەردەمی (ئومەوی)یدا زیاد بوون بەڵام بە بەراورد لەگەڵ سەرچاوەکانی تر ڕێژەی داهاتیان یەجگار کەم بوو.[2]

## دووەم: خەرجیە گشتیەکان:

١ـ خەرجیە سەربازیەکان:

دەوڵەتی (ئومەوی) ئەرکی درێژەپێدانی بڵاوکردنەوەی ئیسلامی بەسەر خەڵکانی سەر گۆی زەویدا خستە سەر شانی خۆی، لەبەر ئەمە لە سەردەمی (ئومەوی)دا قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی ئیسلامی یەجگار بەرفراوانبوو، هەرچەندە بەدەست ئاژاوەو ناکۆکیە نێوخۆییەکانیەوە زۆر سەغڵەت بوو و، دەبوایە سامانێکی زۆرو زەوەندی بۆ دامرکاندنەوەی ئاگرەکانی ئەو فیتنەو ئاژاوانە خەرج کردبایە، بەڵام لەسەر جێبەجێکردنی ئەم ئەرکەی (واتە ئەرکی بڵاوکردنەوەی ئیسلام بە زەویدا) سوور بوو، ئیدی لە میانەی لێکۆڵینەوەی (خەرجی سەربازەکانو پیشەسازیە جەنگیەکان)دا بۆمان دەردەکەوێت کە خەرجیە سەربازیو عەسکەریتاریەتەکەی سەردەمی (ئومەوی) چەندە بووە.[3]

---

١ الإدارة في العصر الأموي (ص: ٢١).

٢ التطور الاقتصادي في العصر الأموي (ص: ٨٦).

٣ التطور الاقتصادي في العصر الأموي (ص: ٩٧).

أ‌- موچەی سەربازان:

(دیوانی سەربان) سەرپەرشتی موچەی سەربازانی دەکرد، هەموو سەرچاوەکانی مێژوو کۆکن لەسەر ئەوە (عومەری کوڕی خەتاب)ی خەلیفە (خودا لێی ڕازی بێت) لە ساڵی (٢٠)ی کۆچیدا دیوانو موچەی سەربازانی داناو ڕێکی خست.[١] ئیدی ئەم دیوانە لەسەر هەمان بنەمای پێشوی مایەوەو ناوی جەنگاوەرانو ڕەچەڵەکو ئەندازەی موچەکانیان لە چەند تۆمارێکدا پارێزگاری لێ دەکرا،[٢] (معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان) بە هۆی گۆڕانی بارودۆخەکانو چاکبوونی باری ئابوری دەوڵەت، ژیانو گوزەرانی سەربازانی چاکتر کردو موچەی بۆ زیادکردن، هەروەها وەکو بەکارهێنانی بەشێك لە سیاسەتی خۆی بۆ ڕاگرتنو پاراستنی هاوسەنگی نێوان هۆزو تیرە (یەمەن)یەکانو هۆزو تیرە (قەیسی)یەکان، ئەم هۆزو تیرانەی بەسەر دەکردنەوەو لە بارودۆخو گوزەرانی دەکۆڵینەوە، لە (مصر)یش: پیاوێکی لە هەر تیرەیەکی ئەو وڵاتە دیاری کردبووو هەموو بەیانیەك بەسەر تیرەکەی خۆیەوە دەگەڕاو دەیگوت: ئایا ئەمشەو کەسێکتان منداڵێکی لە دایك نەبووە؟ ئایا میوانێکتان نەهاتووە؟ جا دەگوترا: ماڵی فلانکەس کوڕێك یان کیژێکیان بووەو ناوێکیان لێ هەڵدەداو دەینوسی، دەگوترا: مێوانێکمان بە خۆیو خانەوادەکەیەوە لە (یەمەن)ەوە هاتوونە لامان، جا ناوی خۆیو تەواوی ئەندامانی خێزانەکەی دەنووسی، کە لە بەسەرکردنەوەی هەموو هۆزەکان دەبۆوە، بە خۆیو ناوەتازەکانەوە دەهات بۆ لای (دیوان)[٣]، ئەمەو (دیوانی ناوەندی) یان (سەرەکی) لە (دەمەشق) بووو مەڵبەندی هەر ویلایەتێکیش وەکو (کوفە، بەصرە، فسطاط) لقێکی (دیوان)ی سەربازی هەبوو.[٤] موچەی سەربازان لە سەردەمی (معاویە)دا بە گوێرەی ئەم پلانە بوو: هەرە بەرز (شرف العطاء) (٢٠٠٠) درهەم بوو، موچەی سەربازانی (عەرەب) کرابووە چەند دەستە:

دەستەی (أ) ٣٠٠ درهەم، دەستەی (ب) ١٠٠٠ درهەم، دەستەی (ج) ١٥٠٠ درهەم، موچەی سەربازە ناعەرەبەکانیش لەم بازنەیەدا بوون.[٥] خەرجی هێزەکانی سوپاو موچەی سەربازان لە سەردەمی (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) بەم شێوەیە بوو:

---

١ طبقات إبن سعد (٢١٣/١)، تأريخ اليعقوبي (٢/ ١٤٣).

٢ الترتيب الإدارية للكتاني (٢٢٥/١)، الدواوين في العصر الأموي (ص: ٣٧).

٣ حسن المحاضرة للسيوطي (٦٥/١)، الدواوين في العصر الأموي (ص: ٥٣٥).

٤ الجيش والأسطول الاسلامي في العصر الأموي (ص: ٥٣٥).

٥ التطور الاقتصادي في العصر الأموي (ص: ٩٨).

... لە هەرێمی (مصر)دا: (٤٠٠٠٠) چل هەزار سەرباز ناویان تۆمارکرابوو، (٤) چوار هەزاریان بە (شەرەفی عطا) تۆمار کرابوون،[١] تێکڕای موچەکانیان دەبووە (٨) هەشت ملیۆن درهەم، باقی ناوە تۆمارکراوەکان (٣٦) سیو شەش هەزار بوون، گریمان یەك سەرباز موچەی ساڵانەی (٣٠٠) سێ سەد درهەم بووبێت، ئەوا کۆی موچەی ساڵانەی هەموانیان خۆی لە (١٠٨٠٠٠٠٠) دە میلۆنو هەشت سەد هەزار درهەم داوە.[٢]

... لە هەرێمی (شام)دا: لە دیوانی (شام)دا ناوی (٦٠) شەست هەزار سەرباز تۆمار کرابوو، موچەی ساڵانەی هەر سەربازێك هەزار درهەم بووە، تێکڕای موچەی ساڵانەی هەموو سەربازەکانی شام گەیشتووەتە شەست ملیۆن درهەم.[٣]

... لە (عێراق)دا: (بصرە) بە نموونە وەردەگرین: (٨٠) هەشتا هەزار جەنگاوەر ناوی تۆمار کرابوو.[٤] موچەی ساڵانەیان لە سەردەمی ولایەتی (زیاد)دا خۆی لە (٣٦) سی شەش ملیۆن درهەم داوە،[٥] ئەگەر بە بەرانبەرکردنی دیوانی (مصر) ڕێژەی لە ١٠٪ی تۆمارکراوان بۆ (خاوەن موچە زۆرەکان= شرف العطاء) دابنێین، ئەوا (٢٠) بیست ملیۆن درهەم دەمێنێتەوە، بەم شێوەیە موچەی ساڵانەی سەربازێکی دیوانی (بەصرە) خۆی لە (٢٧٨) دو سەدو حەفتاو هەشت درهەم داوە، دەکرێت حیسابی تەواوی ناوچەکانی (عێراق) لەگەڵ (بەصرە) بەرانبەر بکەینو ئیدی هەمان ئەنجام دەردەچێت.[٦]

(دیوانی سەربازان) لایەنی بەرپرسیار بوو لە خەرجی هێزەکانی سوپاو موچەی سەربازان، دەوڵەتی (ئومەوی) بایەخی زیادی پێداو لە چەند ڕوویەکەوە گەشەی پێدا، دیاترین ڕووی ئەم گەشەپێدانە ئەمانە بوون:

- نوێنەری معاویە (خودا لێی ڕازی بێت) تایبەت بە دابەشکردنی موچەی دانیشتوانی شاری (مەدینە) ڕاسپێردرابوو کە ڕاستەوخۆو بە دەستی خۆی موچە بدات بە یەکەیەکەی

١ دیوان الجند للسلومي (ص: ١٤٩)، التطور الاقتصادي (ص: ٩٩).
٢ الخطط للمقريزي.
٣ الخراج والنظم المالية للريس (ص: ٩٤).
٤ الخطط للمقريزي.
٥ الحياة الاقتصادية في صدر الاسلام، بطاينة، نقلا عن التطور الاقتصادي (ص: ٩٩).
٦ المصدر نفسه (ص: ١٠٠).

دانیشتوانی شار، بە پێی سیستەمی پێشدا کۆی موچەکە دەدرا بە (عەریف)ەکان، بەڵام ئەم (عەریفانە) کەسیان غایب نەدەداو ناوی مردووەکانیشیان لە تۆماردا نەدەکوژاندنەوە.[١]

- لە سەردەمی معاویەدا (زیاد بن أبیە)ی والی (عێراق) لە خەرجیە ئیداریەکانی (دیوانی سەربازان)ی کەم دەکردەوە، بە جۆرێك ژمارەی ئەو (عەریف)انەی کەم کردەوە کە بەرپرسیاری دابەشکردنی موچە بوون بەسەر خەڵکدا، هات بۆ هەر تیرەیەك (عەریف)ێکی دانا.[٢]

ب ـ خەرجی پیشەسازیە جەنگیەکان:

هەرچەندە ژمارەیەکی دیاریکراومان لەسەر ئەو پارەو سامانە دەست ناکەوێت کە دەوڵەتی (ئومەوی) لە پیشەسازی جەنگیدا خەرجی کردووە، بەڵام لێرەدا بەڵگەیەکی زۆر هەن کە ئەم جۆرە خەرجیە بەرەو زیادبوون رۆیشتووە، دەبینین دەوڵەتی ئومەوی گەشەی بە چەك‌و کەرەستەکانی جەنگی دەریایی داوە، کەشتیرانی ئیسلامی لە سەرەتای دروستبوونیدا خۆی لە (٢٠٠) دوو سەد کەشتی دا.[٣] ئەمجا دەوڵەتی (ئومەوی) پەرەی پێداو تا ئەوەی لە سەردەمی (سلیمانی کوڕ عبدالملك)دا دەوڵەت بوو بە خاوەنی (١٨٠٠) هەزارو هەشت سەد کەشتی گەورە.[٤]

٢ـ خەرجیەکانی (حکومەت):

ئەم جۆرە خەرجیانە دەبوونە دوو بەش:

یەکەم: موچەی فەرمانبەران. دووەم: خەرجی پێداویستیە ئیداریەکان، ئەمەی دوایی تا بڵێی کەمی تێدەچوو، خۆی لە خەرجی مۆمو کاغەزی نوسین‌و هەندێك ئامرازی سادەدا نیشان دەدا کە لەبەر کەمی‌و سادەییاندا لەگەڵ پێداویستیە ئیداریەکانی ئیمرۆدا بەراورد ناکرێن، لەگەڵ ئەمەدا سەردەمی (عومەری کوڕی عبدالعزیز) لە بەرانبەر خەرجکردنی سامانی گشتیدا هێند هەستیار بوو کە لەگەڵ تەواوی سەردەمەکانی تری (ئومەوی)دا جیاوازو کەممەصرەفتر بوو.[٥]

---

١ دیوان الجند للسلومي (ص: ١٦٩)، التطور الاقتصادي (ص: ١٠٢).

٢ الادارة في العصر الأموي (ص: ٣٢٠).

٣ تأريخ الاسكندرية وحضارتها في العصر الاسلامي (ص: ١١٥، ١١٦).

٤ التطور الاقتصادي في العصر الأموي (ص: ١٠٦).

٥ التطور الاقتصادي في العصر الأموي (ص: ١٠٦).

لێرەدا قسەکانمان لەسەر موچەی فەرمانبەران چڕ دەکەینەوە: موچەی فەرمانبەرانی هەر هەرێمێك بە والی هەرێمەکە سپێردرابوو، بە ڕاوبۆچوونی خۆی بڕی موچەی خۆیو کارمەندانی دیاری دەکرد، ئەم سیستەمە ئیداریە (لا مرکزی)یە وایکرد موچەکان بە شێوەیەکی ڕێژەیی گەورە دەربکەون، ئەگەر بێتو ئەو موچانە بە موچەکانی سەردەمی (عومەری کوڕی خەتاب) پێك بگرین ئەم جیاوازیە ڕێژەییەمان بە زەقی بۆ دەردەکەوێت، بە جۆرێك موچەی مانگانەی (زیاد بن أبیە)ی والی عێراق هێند زۆر بوو خۆی لە (٢٥) بیستو پێنج هەزار درهەم دەدا.[١]

وێڕای ئەم موچە زۆرەش لە دەرماڵەی تایبەتیش بەهرەمەند دەبوون، وەك دەبینین یەکێك لە کاربەڕێوەبەرەکانی سەر بە ئیدارەکەی (عێراق) جگە لە وەرگرتنی موچەکەی خۆی لە لایەن (زیاد بن أبیە)ەوە بڕی (١٠٠) سەد هەزار درهەمی وەکو دەرماڵە لە ساڵێکدا پێ دەدرێت.[٢]

لەبەر دەستنەکەوتنی زانیاری تێروتەسەل لەسەر ئەم بابەتە، تەنها چەند نموونەیەك لەسەر موچەکانی سەردەمی (دەوڵەتی ئومەوی) دەهێنینەوە کە بێگومان کاریگەری زۆریان لەسەر ئاستی ژیانو گوزەرانو پاداشتدانەوەی کارمەندانی ئەو دەوڵەتە داناوە:

أ ــ موچەی ساڵانەی هەرە بەرزی کاتیبانی سەردەمی (ئومەوی)و بەشێکیش لە سەردەمی (عەباسی) تا سەردەمی (المأمون) (٣٦٠٠) سێ هەزارو شەش سەد درهەم بوو، موچەی نزمی ساڵانەشیان (٧٢٠) حەوت سەدو بیست درهەم بوو.[٣]

ب ـ بەپێی پەسەندترین هەواڵ زۆرترین موچەی ساڵانەی (سەرۆکی دەزگای شورتە)ی سەردەمی (ئومەوی) گەیشتۆتە (١٠٠) سەد هەزار درهەم.[٤]

ج ــ موچەی دادوەران (کە بریتی بووە لە بڕینەوەی بژێوی بۆیان لە بەرانبەر خۆتەرخانکردنیان بۆ کاری دادوەریو قەزاوەت)[٥] ئاستی هەرەنزمی موچەی ساڵانەی دادوەر

---

١ الادارة في العصر الأموي (ص: ٣١٠).

٢ المصدر نفسه (ص: ٣١٠).

٣ المصدر نفسه (ص: ٣١٠).

٤ المصدر نفسه (ص: ٣١٨).

٥ المصدر نفسه (ص: ٣٣١).

(١٢٠٠) هەزارو دوو سەد درهەم بووە،[١] ئاستی هەرەبەرزیشی خۆی لە (٣) سێ هەزار درهەم داوە.[٢]

٣ـ زەكات‌و شوێنی تێداخەرجكردنی: خوای بەرزو پاك دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَٱلۡغَٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۖ فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٦٠﴾[٣] واتە: (زەكات) تەنها دەدرێت بە: نەداران، هەژاران، كارمەندانی سەری، نۆموسڵمانان –كە پێویستە دڵیان بەوە ڕاگیرێت–، ئازادكردنی كۆیلە، قەرزداران، لەڕێی خودا(موجاهیدان)، ڕێبوار–ی لێقەوماو–، ئەمە شتێكە لە لایەن خوداوە واجب كراوە خوداش زاناو دانایە.

٤ـ (الفيء)و شوێنی تێداخەرجكردنی: خودای بەرزو پاك دەفەرموێت: ﴿مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ﴾[٤] واتە: ئەو ماڵ‌و سامانەی خودا بەبێ جەنگ‌و كوشتار لە خەڵكی ئەو گوندە كافرنشینانەی سەندەوەو بۆ پێغەمبەرەكەی گێڕایەوە: ئەوا هەقی خوداو پێغەمبەرو خزمانی پێغەمبەرو هەتیوان‌و نەداران‌و ڕێبواران–ی لێقەوماوە–.

٥ـ دەیەك‌و شوێنی تێدا خەرجكردنیان:

زۆربەی زۆری ئەو دەیەكانەی لە موسڵمانان وەردەگیرا لەو ماڵ‌و سامانەیاندا بوو كە دەبوایە زەكاتیان لێ بدرێت، لەبەر ئەمە وەكو (زەكات) بەسەر ئەو هەشت پۆلەدا دابەش دەكرا كە زەكاتیان پێ دەشیا.

٦ـ خەرجیەكانی دابینكردنی كۆمەڵایەتی:

ئەم جۆرە خەرجیە زیاتر لە شێوەی خەرجی (عەینی) لە دەوڵەتی (ئومەوی)دا دەركەوت‌و پەرەی پێدرا، نموونەی ئەمە: هەریەكێك لە هەژارانی (عێراق‌و حیجاز) لە ماوەی نێوان (٤٥ـ٥٣ك)یدا چەكەیەكی پێ دەدراو، بڕی هاریكاریە (عەینی)یەكەی بۆ تێدا دیاری دەكرا.[٥] ئەمجا لە سەردەمی (عومەری كوڕی عبدالعزیز)دا (٩٩ـ١٠١) كۆچی، ئەم خەرجیە

---

١ التطور الاقتصادي في العصر الأموي (ص: ١٠٧).

٢ فتوح مصر وأخبارها (ص: ٢٣٦).

٣ التوبة (٦٠).

٤ الحشر (٧).

٥ الادارة في العصر الأموي (ص: ٣٣٥).

(عەینی)یە خەرجی (نەقد)ی پێوە زیادکرا، نموونەی خەرجی (نەقدی): قەرزدانەوە بۆ کەسێك بەبێ زێدەڕۆیی‌و نەفامی‌و کەودەنی کەوتبێتە ژێر باری قەرزەوە، یان خەرجکردنی تێچوونی پرۆسەی هاوسەرگیری بۆ کەسێك پێویستی بە هاوسەرگیریە بەڵام بێ پارەیە.[١]

نموونەی خەرجی (عەینی): فەرمان دەدرا هەر نابینایەك چاوساغێك یان قۆڵگرێکی بۆ دابین بکرێت، بۆ هەر پێنج هەتیوو بێ سەرپەرشت خزمەتکارێك دابنرێت‌و،[٢] هەر لە سەردەمی ئەودا خەڵکانی ناموسڵمانیش لە خەرجیەکانی دابینکردنی کۆمەڵایەتی سودمەندکران.[٣] ئەمجا کارەکە پەرەی سەندو کار بەوە گەیشت ئەم جۆرە خەرجیە لەنێو بەندەکانی خەرجیە گشتیەکانی دەوڵەتدا بوو بە بەندێکی سەرەکی‌و دیاریکراو، نموونەی ئەمە: لە ماوەی (١٢٠ـ١٢٦ی کۆچی) لە (عێراق)دا ساڵانە بڕی دە هەزار درهەم دەخزێنرایە نێو بەندەکانی خەرجی گشتیەوەو، بە مەبەستی سەرپەرشتیکردنی گوزەرانی مێردمنداڵان‌و کیژانی گەڕاوەو قەیرە تەرخان دەکرا.[٤]

## سێیەم: دەوڵەتی (ئومەوی)و گرنگیدانی بە کشتوکاڵ:

لەگەڵ دەرکەوتنی دەوڵەتی (ئومەوی)، موڵك‌و زەوی‌و زارێکی بەرفراوانی (کشتوکاڵ)یش دەرکەوت، خەلیفەو کاربەڕێوەبەری هەرێمەکان هاتنە نێو گۆڕەپانی ئەم کارەوەو بایەخیان بە ژیاندنەوەی زەمینە مردوو بەیارەکانی دەوڵەت‌و تەواوی خاکە بەپیتەکانی وڵاتە فەتحکراوەکاندا، بە جیدی کاریان لەسەر هەرێمی (عێراق)و هاوشێوەکانی کردو بۆ ئەمە پارە زۆری‌و باخەڵگەرمی یاریدەی باشی کردن، ئەمەو والی ئەو وڵاتە چەند پارچە زەویەکی لە خاکی بە ئاوداپۆشراوی هۆرەکان (البطائح)ی بۆ معاویە بە دەرخستنەوەو ژیاندنەوەو بە شێوەیەکی ڕێکوپێك‌و ئەندازەیی ئاوەکەی لەسەر بڕین‌و وشکی کردنەوەو کشتی کردن‌و داهاتی خەلەو خەرمانەکەی هێندە زۆر بوو خۆی لە (پێنج ملیۆن درهەم)دا،[٥] بەم پێیە دەردەکەوێت ڕووبەرەکەی زێدە فراوان بووبێت، معاویە (خودا لێی ڕازی بێت) نەدەهات هەموو داهاتەکەی لەگەڵ خەرجیە تایبەتیەکانی خۆی تێکەڵ بکات، نەخێر، بەڵکو بەشێکی

---

١ الأموال لأبي عبيد (ص: ٣٣٤، ٣٣٥).

٢ سيرة عمر بن عبدالعزيز، لإبن الجوزي (ص: ١٨٣).

٣ الوثائق السياسية والادارية العائدة للعصر الأموي (ص: ٤٣٢).

٤ الأحكام السلطانية للماوردي (ص: ١٧٥، ١٧٦).

٥ فتوح البلدان (ص: ٢٩١)، الخراج والنظم المالية للدولة الإسلامية (ص: ١٨٧).

لێ بۆ پڕکردنەوەی کون‌و کەلێنی خەرجیە گشتیەکان تەرخان دەکرد،[1] هەروەها بە بەڵگەی دوبارە ژێنرانەوەی ئەم زەویانە لە لایەن (حجاج)ی کاربەڕێوەبەری (عێراق)ی سەر بە (عبدالملك)، دروست نیە بڵێین معاویە لەسەر خۆی تاپۆکردبن‌و بە مردنی ئەو بووبنە ماڵە میراتی.[2] هەرچەندە لە ڕووی شەرعەوە ژیاندنەوەی زەوی بە شێوەیەکی گشتی حەڵاڵەو ڕێی پێدراوەو پاڵپشت بە چەند فەرموودەیەك سەبارەت بە ئەمە هۆکارێکیشە بۆ خاوەنداریێتی، لێرەدا حوکمڕان‌و خەڵکانی تر لە ئاقار ئەم حوکمەدا یەکسانن، بەڵام حوکمڕان مەرجی زیاتری لەسەر دانراون، دیارترینیان:

- بەکارنەهێنانی پۆست‌و دەسەڵات: بەڵکو وەکو تاکێکی سادەی نێو کۆمەڵگا دەتوانێت زەوی بەیارو بەردەڵان (صخری) دابڕێت‌و کشتی بکات.
- بەکارنەهێنانی سەروەت‌و سامانی گشتی: بەڵکو دەبێت بە سامانی تایبەتی خۆی ئەم چالاکیە ئەنجام بدات.
- نابێت بە هۆی ئەم چالاکیەیەوە زیان بە موسڵمانان (تاك‌و کۆمەڵیان)و هەتا ئەهلی (ذمة)ش بگات.[3]

بێگومان هەڵمەتی زیندووکردنەوەو کشتکردن‌و داچاندنی زەوی کاریگەریەکی گەورەو بەرچاوی لەسەر موڵکداریێتی زەوی‌و خاکی کشتوکاڵی بەرفراوان دانا، معاویە جزیرگەیەکی هەڵکەوتووی نێوان دوو چۆمی (دیجلەو فوراتی) بۆ یەکێك لە براکانی خۆی دابڕی، (زیاد بن أبیە) ئاوی بەسەر گێڕا، کاتێك براکەی بینی ئەوزەویەی بۆ ئەو تەرخانکراوە گومانی برد خڕ ولافاوگرە، (زیاد) بە دوو سەد درهەم لێی کڕی، ئەمەو (زیاد) دوای ئەمە خاکی تریشی پێوە زیاد کردو بەرفراوانی کرد، کار بەوە گەیشت چەندین جۆگای بۆ هەڵبەستن،[4] جارێکیان سەد پارچە زەوی بەرفراوانی بۆ خۆی لەسەر ڕووباری (الأبلة) دابڕین‌و ڕووبارە ئاوێکی بە مەبەستی ئاودێرکردنیان هەڵکەندو ناولێنا(جۆگای زیاد) ، بە هەمان جۆر ڕووبەری (٦٠) شەست (جەریب)- واتە جێی بنەتۆوی ٦٠ تەغار دانەوێڵە- ی لەسەر هەر یەکێك لە کچەکانی خۆی (واتە کچەکانی زیاد) تاپۆ کرد، بەم شێوەیەو لە سەردەمی خەلیفەکانی (ئومەوی)ی دوای معاویە (خودا لێی ڕازی بێت)دا خاوەنداریێتی زەوی‌و زاری کشتوکاڵی

---

١ الحياة الإقتصادية والإجتماعية، بطاينة (ص: ١٣٥).
٢ الخراج والنظم المالية للدولة الإسلامية للريس (ص: ٢١٤).
٣ التطور الاقتصادي في العصر الأموي.
٤ معجم البلدان (٤٣٥/١)، التطور الإقتصادي (ص: ١٨٠).

بەرەوپێش چوو، هەرچەندە ئەمە زیاتر لە بنەماڵەی ئومەوی و هەندێك لە پیاوماقوڵانی (قورەیش)دا خۆی نیشان دەدا، بەڵام لەسەر ئەوان کورت هاڵنەهاتبووو خەڵکانی تریش خاکیان دادەبڕین‌و لەسەر خۆیان تاپۆ دەکردن،[١] ئیدی لەو نێوەدا خاکی بەرفراوان هەبوون‌و خەڵك بۆ خۆی کشتی دەکردن، نموونە لەسەر ئەمە: (زیاد) پارچە زەویەکی بۆ یەکێك دادەبڕی‌و بۆ ماوەی دوو ساڵ لێی دەگەڕا، ئەگەر نەیکێڵابایەو نەیچاندبایە لێی دەستاندەوە،[٢] ڕووبەری ئەو زەویە کشتوکاڵیانە جێی بنەتۆوی (٦٠ـــ١٠٠) تەغار دانەوێڵە بوون.[٣]

بەڵام بە شێوەیەکی گشتی ڕەخنە لەم شێوازە خاوەندارێتیانەی سەردەمی ئومەوی دەگیرێت، چونکە بە ڕەگەزی (خۆخۆیی‌و موحابات) ئاوێتە کرابوو، زەوی‌و زارە گەورەو بەرفراوانەکان یان موڵکی ئەندامانی بنەماڵەی (ئومەوی) بوون، یان هی پیاوماقوڵانی (قورەیش) بوون، لەوانەیە ئەمە بۆ ئەمە بگەڕێتەوە کە دەوڵەت لە خەڵکانی پایەدارو سەرمایەدار گەڕابێت تا بە هۆی پارە بێ شومارەکانیانەوە بێنە مەیدان‌و بتوانن ئەو زەوی‌و زارانە ڕەنێو و بەرهەم بێنن، بەڵام ئەمە سەری کێشا بۆ ئەوە سەروەت‌و سامانی زۆروزەوەند بکەوێتە بەردەستی چەند تاکێکی کەمی نێو کۆمەڵگا.[٤]

کشتوکاڵ لە سەردەمی (ئومەوی)دا بە شێوەیەکی سەرەکی پشتی بە ئاوی ڕووبارەکان بەستبوو، لەبەر ئەوە دەبینین مەڵبەندە سەرەکیەکانی بەرهەمی کشتوکاڵی بریتی بوون لە (عێراق‌و مصرو شام)و بە تایبەتیش ئەو خاکانەیان کە لە دەورەی ڕووبارەکانیان هەڵکەوتبوون.[٥] (کەرتی تایبەت)یش ڕۆڵێکی گەورەو بەرچاوی لە بەرەوپێشچوونی بواری (کشتوکاڵ)دا گێڕا، زەوی‌و زارێکی بەرفراوانی لە بەیاری‌و وێرانی ڕزگارکردو ژیاندەوە، ناوچەی هۆڕەکان (البطائح) کە هەر لە سەردەمی حوکمڕانی فارسەکان بەسەریەوە تا بە سەردەمی حکومەتی (ئومەوی) دەگات بریتی بوو لە چەند پارچە زەوی بەرفراوانی بە ئاو داپۆشراوی قامیشەڵانی زۆنگاو، بەڵام دەوڵەتی (ئومەوی) لە سەرەتای کارەکانیەوە کاری لەسەر کردو ئاوەکانی لەسەر بڕین‌و، دوای وشککردنەوە چاکی کردنەوەو کردنیەوە بە زەوی

---

١ أرض الصوافي للمصيري (ص: ١٢٢).

٢ تطوير نظام ملكية الأراضي، محمد علي (ص: ١٩٠، ١٩١).

٣ التطور الاقتصادي في العصر الأموي (ص: ١٨٨).

٤ تطوير نظام ملكية الأراضي، محمد علي (ص: ١٩٠، ١٩١).

٥ التطور الاقتصادي (ص: ١٨٨).

لە بارو بەپیتی کشتوکاڵیو بەرهەمدار.[١] خاوەنداریێتی کشتوکاڵی تایبەت پەرەی پێدراو بە هۆی ئەمەوە ئاستی بەرهەمی کشتوکاڵی بەرەو سەر هەڵکشاو، ئیدی کار بەوە گەیشت زەویو زارێکی زۆری دوور لە سەرچاوەی ئاودێری (کە بریتی بوو لە ئاوی ڕووبار) پەیدا بوون، تەکنەلۆژیای ئاودێری گەشەی سەندو بزوتنەوەی لێدانی جۆگای گەورەو جۆگەلەکەی ئاودێری بە سوودوەرگرتن لە ئاوی ڕووبار بە گوێرەی شێوازی ئەندازەیی ئەو کات بۆ ئاودانی زەویە کشتکراوەکان سەری هەڵدا، ئەمەو کەرتی تایبەت ڕووبارگەلو جۆگاگەلێکی زۆری ئاودێریان هەڵبەستنو لە ئەنجامدا بواری کشتوکاڵ گەشەیەکی گەورەو بەرفراوانی بەخۆوە بینیو[٢]، تەکنەلۆژیای کشتوکاڵی لە ولاتە تازە فەتحکراوەکانەوە بەرەو مەڵبەندە سەرەکییو گشتیە کشتوکاڵیەکانی دەوڵەتی (ئومەوی) گوێزرایەوە،[٣] بەڵام دواتر بە هۆی ژمارەیەك هۆکاری جۆراوجۆرەوە کەرتی کشتوکاڵی لە ناوچەی خۆرهەڵاتی دەوڵەتدا بەرەو داڕوخان چوو لە ڕستەی ئەو هۆکارانە:

١ـ ئاڵۆزیو پشێوی سیاسیو لە دەستدانی هێمنایەتی لەناوچەکەدا: کە بە هاتنی (یەزیدی کوڕی معاویە)و (معاویەی دووەم)و (مەڕوانی کوڕی حەکەم)و هتد، ئەمە دروست بووو کاردانەوەی خراپی لەسەر ئاستی بەرهەمی کشتوکاڵی دانا.

٢ـ کەڵەکەبوونی سەروەتو سامان لەبەر دەستی خەڵکانێکی کەمی دانیشتوی ناوچەکەدا، بە چەشنێك زۆرینەی پێکهێنەری دانیشتوان ناعەرەب بوون،[٤] ئەمە بووە مایەی لاوازبوونی ڕەوتی مامەڵەکردن بە دراوو کالا، بە دەربڕینێکی تر داتەپینی سەرخانو و ژێرخانی ئابوری لە ناوچەکەدا ڕوویدا.

٣ـ دەستپێکردنەوەی وەرگرتنی باجی نەورۆزانە، دەگوترێت ئەمە لە سەردەمی معاویە (خودا لێی ڕازی بێت)دا دەستی پێکراوە،[٥] هۆی ئەمە دەگەڕێتەوە کە هەرچەندە ئیسلام قەدەغەی کردبوو، بەڵام خەڵك خویان بە دانیەوە گرتبووو وازیان لێ نەدەهێنا،[٦] دەیاندا بە کوێخاو مامۆتکە ناموسڵمانە ناوچەییەکان، معاویە (خودا لێی ڕازی بێت) بەم بڕیارەی

---

١ التطور الاقتصادي في العصر الأموي (ص: ١٩٠).

٢ الادارة في العصر الأموي (ص: ١٩١).

٣ التطور الاقتصادي في العصر الأموي (ص: ١٩١).

٤ المصدر نفسه (ص: ١٩٦).

٥ تأريخ اليعقوبي (٢/٢١٨).

٦ مقدمة في التأريخ الاقتصادي الغربي (ص: ٣١).

ویستی ئەو بڕە پارە زۆرە لەم سەرگەورە ناموسڵمانانە بکێشێتەوە نەبادا بە کەڵەکەبوونی لە لای ئەوان ببێتە مایەی هەڵگەڕانەوەیان و لە دژی ئیسلام و موسڵمانان خۆیانی پێ بەهێز بکەن، ئەو (خودا لێی ڕازی بێت) دەستی بە وەرگرتنی باجی (نەورۆزانە) یان (میهرەجانانە) کردو لە بەرژەوەندیە گشتیەکانی ئوممەتی ئیسلامیدا خەرجی دەکرد، بەڵام دوابەدوای ئەوە بەگ و ئاغا نێوچەیەکان هونەرێکی تریان لە باج و سەرانە لەسەر ژێردەستەکانیان داهێناو[1]، وێڕای ئەوە کە بە زۆری و زەبروزەنگ لێیان دەسەندن هێندەی دیکەیان باری سەر شانی جوتیاران و کشتیاران قورس کرد.[2]

٤ـ ملکەچکرانی پرۆژە کشتوکاڵیەکان بۆ گوشارە سیاسیەکان: ئەمەو جەنگی دەوڵەت لەگەڵ هێزە بەرهەڵستکارە سیاسیەکانی ناوچەکە سەری کێشا بۆ بەرتەسککردنەوەی ڕاگرتن و خراپکردنی پرۆژە کشتوکاڵیەکانیان و ئەنجامەکەی بە خراپی بەسەر ئابوری گشتی دەوڵەتدا شکایەوە، بۆ نموونە: لە سەردەمی (حجاج)دا ئاو دزەی کردە نێو زەویە ژێنراوەکانی هۆڕەکان و، (حجاج)یش بە سیفەتی ئەوە والی ناوچەکەیە و بە تۆمەتی ئەوە خاوەنانی ئەم زەویانە هاریکارو پشتیوانی (إبن الاشعث)ی نەیارنی هیچ هەوڵێکی خۆی نەخستە گەڕ لە پێناوی بەرگرتن بەم لافاوانە و بەرنەکەوتنی زیان بەم خاک و زەویانە ، ئیدی ئاو بەسەریاندا گەڕاو وێرانە بوون.[3]

٥ـ ناڵاندنی دەوڵەتی ئومەوی لە سەرەتای دامەزراندنیەوە بە دەست جۆرە خەڵکێکەوە کە بەرەو (عێراق) کۆچیان کردبوو، ئەمانە لەگەڵ ئەوەدا بە دەست بێ کاری و دەستبەتاڵیەوە دەیانناڵاند، ناویشیان لە تۆماری موچەخۆراندا نەنوسرابوو و هیچ پارچە زەویشیان بە دەستەوە نەبوون تا کشتی بکەن، جا لە جیاتی ئەوە بچن لە بوارەکانی تردا کار بۆ خۆیان دابین بکەن، تاقمە خەڵکێکیان دەچوو سیستەمی ئاودێری تێکدەداو ئاوی بەسەر زەوی و زارە کشتوکاڵیەکاندا دەگێڕا، لە ئەنجامدا دەیان ڕووبەری کشتوکاڵی خراپ کران و کەوتنە ژێر ئاوەوە، کاتێك (زیاد) بوو بە والی عێراق کۆتایی بەم کردەوە تێکدەرانە هێنا.[4]

---

١ الخراج، لأبي يوسف (ص: ١٨٦، ١٨٧).

٢ الاحكام السلطانية للماوردي (ص: ١٧٥).

٣ إدارة العراق صدر الاسلام، رمزية خيرو (ص: ٨٦).

٤ إدارة العراق صدر الاسلام، رمزية خيرو (ص: ٨٦).

٦ـ دروستبوونی شەڕو پێکدادانی چەکدارانە لە نێوان دەوڵەتی (ئومەوی)و ئەو جوتیارە گوندنشینانەی بەرەو شارەکان کۆچیان کردبوو، ئەمە لەو کاتەدا ڕوویدا کە (حجاجی کوڕی یوسف)ی والی (عێراق) هەوڵیدا بە تۆبزی‌ۆ زەبروزەنگ بۆ سەر زەویەکانیان بگێڕێتەوەو سەرانەیان لەسەر دانێ، ئەم شەڕە هاوکات بوو لەگەڵ دەرچوونی (إبن الأشعث) لە دژی دەوڵەتی (ئومەوی)و خەڵکەکەش چوونە ژێر ئاڵای ئەوەوە.[١]

ئیتر بە هۆی ئەم هۆکارانەو چەند هۆکارێکی تریشەوە نیشانەکانی داڕوخان‌و لە گرێژەنەچوون بە کەرتی کشتوکاڵی گشتی ناوچەی خۆرهەڵاتی دەوڵەتی (ئومەوی)یەوە دەرکەوتن،[٢] هاوکات لەگەڵ ئەمەدا هەندێك هەوڵ‌و پرۆژە خرانەگەڕو کەمێکیان لەو هەرەسە بێڕەزایە کەم کردەوە، دیارترینی ئەو هەوڵانە:

أـ دروستکردنی پردێك لەبەردەم لافاوی سەر شاری (کوفە) لە لایەن (زیاد بن أبیە)وە،[٣] دەرەنجام دەرفەت وەرگیرا: بۆ بەکارهێنانی ئەو زەوی‌و زارانەی لافاو لە کاتی هاتنیدا دایدەپۆشین‌و چاوەڕێی نیشتنەوەی ئاوەکەی دەکراو جارێکی تر کشت دەکرانەوە، لە لایەکی ترەوە دەروازە لە بەردەم چاندنی شەتڵە نەمام‌و ڕووەکە درێژخایەنەکان لەو زەویانەدا کرایەوەو، چیدی چاوەڕێی ئەوە نەکرا هەر بە دەغڵ‌و دانەوێڵە داچێنرێن، ئیدی ئەم پردە هێند گرنگ‌و بایەخدار بوو والی لە دوای لە سەردەمی (ئومەوی)دا بایەخیان پێ دەدا.[٤]

ب ـــ گواستنەوەی هێزی کاری کشتوکاڵی (جوتیاران‌و وەرزێڕان‌و سەپانان) لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر بە نیازی پەرەپێدان و گەشەسەندنی کشتوکاڵ لە باقی وڵاتانی تری جیهانی ئیسلامدا، نموونەی ئەمە: گواستنەوەی پەنجا هەزار خێزانی کارامەو پسپۆڕی بەناوبانگ لە بواری کشتوکاڵدا لە (بەصرەو کوفە)وە بۆ (خۆراسان) لە لایەن (زیاد)ەوە،[٥] ئەمەو دەوڵەت ئەم بەرپرسیارێتیانەی خستبوونە ئەستۆی خۆی: دامەزراندنی پرۆژەی ئاودێری گەورەو جۆماڵکردن‌و چاککردنەوەیان، وەکو هەڵکەندنی بیرو هەڵبەستنی جۆگاو، چاککردنەوەی کۆن‌و کەلێنی جۆگاکان‌و برگە هەڵبەستنی ئاو و دروستکردنی بەنداو،

---

١ الخراج والنظم للريس (ص: ٢١٩)، الاصلاحات الاجتماعية والاقتصادية في الدولة الأموية (ص: ٧١).
٢ التطور الاقتصادي في العصر الأموي (ص: ٢٤٧).
٣ الادارة في العصر الأموي (ص: ٢٤٧).
٤ المصدر نفسه (ص: ٢٤٧).
٥ مقدمة في التأريخ الإقتصادي العربي للدوري (ص: ٢٧).

بەڵام خاوەن زەوی‌و زارەکان: جاروبار بەشداری جۆماڵکردنیان دەکردو بە تەبیعەت لە نزیك خاکەکانیانەوە دابینکردنی ئامرازەکانی خاکاوکردن‌و ئاودێری‌و جوگا هەڵبەستنیان دەچووە سەرشان.[١] حوکمڕانانی (ئومەوی) بە گوێرەی توانای خۆیان هەوڵەکانی خۆیان بە خاتری بەراوکردن‌و بەرهەمهێنانی زەوی‌و زاری کشتوکاڵی خستنەگەڕو ئیشیان لەسەر فراوانکردنی بازنەی ئەو زەویانە کردو، ئیدی لەم نێوەداو لە ڕێی دابینکردنی ئاوو ئامرازەکانی ئاودێری خاکە کشتوکاڵیەکانی (شام)یان بە مەبەستی کشت کردن‌و داچاندن سازوباز کردن.[٢]

تا ئەوەی کۆشك‌و تەلارانێکی دەوڵەتی ئومەوی کە لە بیابانەکاندا دروستکرابوون ببوونە مەڵبەندی گەورەو گرنگی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵ، بە چەشنێك دامەزراوەی ئاودێریان لە دەورە دروستکرابوون‌و بەڕێی کارێزاوو بیرەئاوگەلێکەوە جۆگای گەورەیان لە دەورە هەڵبەسترابوون‌و زەوی‌و زارێکی زۆریان دەکردە شیناوەردی‌و بەرهەمی باشیان لێ ڕەنێو دێنان،[٣] معاویەی خەلیفە بایەخێکی زۆری بە کشتوکاڵ دەداو هەوڵی دەدا ئاستی بەرهەمهێنانی بەرز بکاتەوە، لە ڕێگای پشتبەستن بە خەڵکانی شارەزاو کارامەی ناوچەکانەوە دەیەویست پەرە بە پێشخستنی ئامرازەکانی ئاودێری‌و بەپیتکردنی خاکەکان بدات.[٤] بە هەمان جۆر (یەزیدی کوڕی معاویە) بە خاتری ئەوە لە بواری کاروباری کشتوکاڵدا شارەزاییەکی باشی هەبوو گرنگی بە چاککردن‌و بەرەوپێشبردنی سیستەمی ئاودێری دەدا بە (ئەندازیار) ناوی دەرکردبوو، فەرمانی هەڵکەندنی کارێزاوێکی دەرکرد پاشان کارێزاوەکە ناوی (ڕووباری یەزید)ی لێنرا، پێشدا کانیەکی بچووك بوو تەنها دوو پارچە زەوی لە ناوچەی (غوطة)ی پێ بەراو دەکران، بەڵام (یەزید) بە ئەندازەی (٦) شەش بست پانی‌و (٦) شەش بست قوڵی گەورەو فراوانی کردو دەرەنجام ئاوێکی هێندە زۆر هەڵدەقوڵاو هەڵدەڕژا بەشی ئاودانی خاکێکی بەرفراوانی ناوچەکەی دەکرد.[٥] بەمە کشتیاران‌و جوتیاران دەرفەتیان وەرگرت‌و هەندێك لە زەویە کەسنەکێڵەکانیان دەرهێنان و خستیاننە نێو پرۆسەی بەرهەمهێنانەوە.[٦] هەرچەندە زۆرینەی خاکی وڵاتی شام پشتی بەو بارانە وەرزیانە دەبەست

---

١ تأريخ بلاد الشام الاقتصادي، عاطف رجال (ص: ١٣٥).
٢ التنظيم الإقتصادي في صدر الاسلام (ص: ٨٢).
٣ تأريخ بلاد الشام الاقتصادي، عاطف رجال (ص: ١٣٦).
٤ النزعات المادية، حسين مروة (٤٧٦/١).
٥ تهذيب تأريخ دمشق (٢٤٥/١، ٢٤٦).
٦ تأريخ بلاد الشام الاقتصادي، عاطف رجال (ص: ١٤١).

کە لە نێوان مانگی تشرینی یەکەم تا مانگی نیسان دەبارین،[1] بەڵام خاکە دەشت‌و فراوانەکان بە ئاوی ڕووبارو کانیاوو کارێزاوەکان ئاو دەدران‌و بەشێکی تریش لە زەوی‌و زارەکانی بە هۆی بەرزیانەوە لە ئاستی ڕووبارەکان دەبوایە بە بەکارهێنانی ئامرازە باوەکانی ئەو سەردەمە ئاویان لە ڕووبارەکانەوە یان لە بیرو کارێزاوەکانەوە بۆ بەرزکرابایەوەو بەراو کرابانایە.[2]

بە حوکمی ئەوە بەشێکی زۆری خاکی (شام) بە ئاوی کانی‌و سەرچەشمەکان ئاو دەدران، ئەوا ئاوی کانی لەم بوارەدا بە بایەخەوە حیسابی بۆ دەکرا،[3] بەرهەمەکانی دانەوێڵەو میوەجات‌و ڕووەك‌و سەوزەو گژوگیا بۆنخۆشەکانی وەکو: گەنم‌و جۆو برنج‌و زەیتون‌و خورماو تری‌و هەنجیرو قامیشی شەکرو نۆك‌و فاصۆلیاو نیسك‌و کونجی‌و لۆکەو ڕێحانەو نەعناو جۆرەها سەوزەو میوەو بەرهەمی تریش بەرەکەتیان تێکەوتبوو.[4]

## چوارەم: گرنگیدانی دەوڵەت بە بازرگانی ناوخۆو دەرەوە:

دەوڵەتی ئومەوی) دەکەوتە نێوەڕاستی دەوڵەتانی ئەوپەڕی خۆرهەڵاتی وەکو (چین‌و هیند)و دەوڵەتی (بیزەنتی) خۆرئاواوە، واتا بە پێی پێوەرەکانی ئەو چاخە گرنگترین پەیوەندی بازرگانی خۆی بەم دوو جەمسەرەوە گرێدابوو،[5] دوای ئەوە (معاویە) پۆستی خیلافەتی وەرگرت بارودۆخ ئاسایی بۆوەو کاروبارە ئیداریەکانی جێگیر بوون، (بزوتنەوەی بازرگانی ناوخۆ)ش چووەوە سەر ڕاستەهێڵی پێشووی‌و گەشایەوە،معاویە بایەخی بە بەرژەوەندی بازرگانان داو کاری بۆ فراوانکردنی بازنەی بازرگانی ئەنجام دا، دانیشتوانی (شام) لەم بوارەدا پێش خەڵکانی تریان دایەوەو بە سودوەرگرتن لە (کەشتیرانی ئیسلامی) لە دەروازەی ئەورووپای خۆرئاوایان داو پەیوەندی بازرگانیان لەگەڵ بەست، یەکێك لەو هۆکارە کاریگەرانەی چالاکی زیادیان بە جموجۆڵی بازرگانیدا بریتی بوو: لەو پارەو سامانە زۆرو زەوەندەی کەوتبووە بەردەست چینی ئەندامانی باڵای حوکمەت‌و دارودەستەکانیەوە، سەرکەشی‌و حەزکردن بە خۆشگوزەرانی لە دڵ‌و دەروونیاندا چەکەرەی کردو ئارەزوویان چووەسەر کەلوپەل‌و کاڵا ناسەرەکیەکان (کەمالیات)و، ئیدی دەستیان بە کڕینی کاڵا

---

١ مفاتيح العلوم للخوارزمي (ص: ٤٦).

٢ تأريخ بلاد الشام في العصر الأموي (ص: ١٤١).

٣ تأريخ بلاد الشام في العصر الأموي (ص: ١٤٣).

٤ المصدر نفسه (ص: ١٤٧ـ١٥٦).

٥ التطور الاقتصادي في العصر الأموي (ص: ٢٠٥).

گرانبەهاکان کردو، بەمە بازرگانان بەخۆکەوتن‌و بازرگانیش پەرەی سەند.[1] خەڵکانی تیرەی (ئومەوی) ڕۆڵی گەورەیان لە جیهانی بازرگانیدا دەگێڕا، بە تایبەتی (أبو سوفیان)ی باوکی معاویە (خودا لێی ڕازی بێت) یەکێك بووە لە ڕیزی بازرگانە گەورەو زەنگینەکانی هۆزی (قورەیش)، کاتێکیش (معاویە) لە (شام) والی بوو، لە سەردەمی خیلافەتی (عوسمان) (خودا لێی ڕازی بێت)دا کاروانە بازرگانییەکانی خۆی لەوێوە بەرەو شارەکانی نیوەدوورگەی عەرەبی بەڕێ دەکردن،[2] بازرگانان لە سەردەمی دەوڵەتی (ئومەوی)دا پێگەیەکی بەرزی کۆمەڵایەتیان داگیرکردبوو، لە پێناو بەگوڕترکردنی بزوتنەوەی بازرگانی کۆمپانیای هاوبەشی گەورەیان دادەمەزراندن، هەر یەکێك لە هاوبەشانی کۆمپانیا بە بڕێك پارەیان بەکار یان بە هەردووکیانەوە دەچووە مەیدانەوە، هەرکاتێك خاوەن سەرمایە سەرمایەی خۆی لە بەرانبەر بڕە قازانجێکی دیاریکراو بە یەکێکی تر دابایە تا بازرگانی پێوە بکات، ئەوا ئەم ڕێکەوتنە پێی دەوترا (مضاربة)،[3] ئەمەو کۆمپانیاکانی (مضاربة) پەرەیان سەندو بوونە هۆکارێکی گەورەو گرنگ لە بواری کاری بازرگانیدا.[4]

بازاڕە ناوچەییەکان بەجموجۆڵی مامەڵە و کڕین‌و فرۆشتن گەرمداهێنران، (دیمەشق)ی پایتەختی دەوڵەت بە هۆی چوونە نێو بارودۆخە سیاسیە نوێکەیەوە ببوو بە مەڵبەندێکی گەورەو گرنگی بازرگانی، گۆڕانێکی بەرچاوی بەسەر ئەو ڕێگاو ئاراستە بازرگانیانەدا هێنا کە پێشدا لەسەردەمی (بێزەنتی)دا دەهاتنە سەری، بە جۆرێك (دیمەشق) بوو بە پایتەختی خیلافەتی (ئومەوی)و وێستگەیەکی سەرەکی بازرگانی خۆرهەڵات،[5] دوایەش پاش ئەوەی کاروانە کاڵاهەڵگرەکانی خۆرهەڵات ڕاستەوخۆ ڕوویان لە (انطاکیة)ی کەنارەئاوی شام دەکرد، (دیمەشق) بوو بە مەڵبەندی تێدابەڕێکردنی کاڵا بازرگانییەکان بۆ تەواوی شوێنە جۆراوجۆرەکان، بەم جۆرە (دیمەشق) بوو بە مەڵبەندێکی گرنگ‌و ستراتیژی بازرگانی وا کە هەموو جۆرە کاڵایەکی هاتووو بەرهەمی ناوخۆ لە بازاڕەکانیدا لەسەریەك دابنرێن، تا ئەوەی کەسێکی وەکو (یاقوت) بڵێ: شتێك بوونی هەبێ مەحاڵە لە بازاڕەکانی (دیمەشق)دا دەست

---

١ تأريخ بلاد الشام الاقتصادي في العصر الأموي (ص: ١٦٨).

٢ المصدر نفسه (ص: ١٧٢).

٣ المصدر نفسه (ص: ١٧٤).

٤ المصدر نفسه (ص: ١٧٤).

٥ تأريخ بلاد الشام الاقتصادي (ص: ١٨٣).

نەکەوێت، هەرچ کاڵایەکی گرانبەها هەیەو لەم سەرەوسەری وڵاتەکانی دنیاڕا بۆی هاتووە، لەوێدا دەست دەکەوێت.[١]

هەروەها (دیمەشق) بە حوکمی ئەوە هاوسنووری بیابانە، ببوو بە مەڵبەندێکی گرنگی بازرگانی بۆ خەڵکانی بیاباننشین،[٢] شارەکانی تری شام (حلب، رصافة، حمص، رملة، ورش، أنطاكية) وەکو دیمەشق بە بازاڕ گەرمیو شوێنی گرنگی بازرگانی ناویان دەرکردبوو،[٣] (دیمەشق)ی پایتەختی شام، ببووە وێستگەی کاروانە کاڵاهەڵگرەکانی خۆرهەڵات، هەرچەندە (کوفەو بەصرەو موصڵ)و شارەکانی (حیجاز)و تەواوی شارەکانی تریش بازرگانیان تێدا گەشابۆوە، بەڵام پشکی گەورەی ئەم گەشانەوەو پێشکەوتنە زیاتر بەر شارەکانی شام کەوتبوو و بە چەشنێك حیسابی مەڵبەندی گەورەی بازرگانیو بازاڕی گرنگیان بۆ دەکرا، بە هەمان شێوە هەندێك بازاڕی وەرزی کە لە هەندێك شاردا دەکرانەوە، کاڵای هەمەڕەنگی زۆریان تێدا دەخرانەڕووو، دەرفەتێکی بەرفراوانیان دەدایە دەست دانیشتوانی شارو گوندەکان تا بە ئاسانی پێداویستیەکانی خۆیانیان تێدا دەستەبەر بکەن، زیاد لەمەش ئەم جۆرە بازاڕانە بە نیسبەت ئەو بازرگانانەی لە شوێنە جۆراوجۆرەکانەوە بۆیان دەهاتن تا بڵێی گرنگ بوونو سوودی زۆریان لێ دەبینین، یەکێك لەم جۆرە بازاڕانە کە لە سەردەمی دەوڵەتی (بێزەنتی)یەوە دامەزرابووو، لە سەردەمی (ئومەوی)یشدا بوونی مابوو، بازاڕی (بصری) بوو، کە ماوەی کرانەوەکەی (٣٠ــ٤٠) ڕۆژی دەخایاند، بازاڕی (أذرعات)یش لە ڕیزی ئەو بازاڕانەدا بوو تا دوای سەردەمی (دەوڵەتی ئومەوی)یش هەر بەرقەرار بوو.[٤]

بەڵام سەبارەت بە بازرگانی دەرەوە لە سەردەمی (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت)و (یەزید)ی کوڕیدا: ئەوا بازرگانی گەڵ دەوڵەتی (بێزەنتی) بەرەو گەشانەوەو بەهێزبوون چوو، چەند هۆکارێك بەشداری ئەم گەشانەوەو پێشکەوتنەیان کرد، لەوانە:

١ــ زۆری جەنگو هەراو هاڵۆزی لە ناوچەکانی بەشی خۆرهەڵاتی دەوڵەتی (ئومەوی)، ئەوە لە قەبارەی مامەڵەی بازرگانی نێوان ئەو دەوڵەتەو دەوڵەتانی خۆرهەڵاتی بچووك

---

١ معجم البلدان (٢/٤٦٥).

٢ تأريخ بلاد الشام الاقتصادي (ص: ١٨٣).

٣ المصدر نفسه (ص: ١٨٣).

٤ تأريخ بلاد الشام الاقتصادي في العصر الأموي (ص: ١٨٧).

کردەوەو، دەرەنجام قەبارەی مامەڵە بازرگانیەکان لەگەڵ دەوڵەتی (بێزەنتی)ی خۆرئاوا گەورە بوون.

٢ـ سەقامگیربوونی ئاسایشی دەوڵەتی ئومەوی، هانی سەرمایەدارانێکی زۆری دا لە ناوچە جەنگیەکانی خۆرهەڵاتەوە بەرەو هەرێمی شام کۆچ بکەن‌و هەلی لەبار بۆ بازرگانیکردن‌و بەرهەمهێنا بەدەست بخەن.

٣ـ پشتبەستنی تەواوی هەریەکێك لەو دوو دەوڵەتە بە ئەوەکەی تریان لە بواری پێداویستیەکانی بەڕێوەچوونیدا، چۆن دەوڵەتی (بێزەنتی) بۆ بەدەستخستنی کاغەزی لە زەل دروستکراو (أوراق البردي) پشتی بە وڵاتانی جیهانی ئیسلام دەبەست، بە هەمان شێوەش دەوڵەتی ئومەوی بۆ زیادکردنی پارەی لە زێڕ دروستکراو لەنێو وڵاتدا پشتی بە دەوڵەتی (بێزەنتی) دەبەست، هەندێك لەو نیشانانەی کە دەری دەخەن بازرگانی نێوان دەوڵەتی (ئومەوی)و دەوڵەتی بێزەنتی لە سەردەمی (معاویە)و دوای ئەویشدا بەهێزو توندوتۆڵ بووە، ئەمانەن:

أـ هەبوونی ڕێژەیەکی بەرچاوی دیناری زێڕی بێزەنتی لەنێو دەوڵەتی (ئومەوی)دا، کە بە هۆیەوە مامەڵەی کڕین‌و فرۆشتنی نێوخۆ ڕایی دەبوو.

ب ـ بەردەوامبوونی پیشەسازی کاغەزی زەل (البردی) لە (مصر)و بەرهەمهێنانی بە پێی سیستەمی (بێزەنتی) هەتا سەردەمی (عبدالملك کوڕی مەروان).[١]

## پێنجەم: پیشەسازی:

لە سەردەمی دەوڵەتی (ئومەوی)دا ژینگە ئابووریەکە (کە زیاتر ژینگەیەکی کشتوکاڵی بوو) باڵی بەسەر جۆری پیشەسازی ئەو کاتدا کێشابوو، بە هۆی ئەمەوە ئەو جۆرە پیشازیانە برەویان پەیدا کرد کە بۆ ڕاییکردنی کارەکانیان پشتیان بەو مادە خاوانە دەبەست کە بەرهەمی کەرتی کشتوکاڵی بوون، ئیدی پیشەسازی ڕستن‌و چنین‌و ئاش‌و شەربەت نموونەی پیشەسازیە باوەکانی ئەو سەردەمەن، هەروەها پیشەسازی کەلوپەل‌و پێداویستیەکانی بیناسازی بە هاوشانی بزوتنەوەی ئاوەدانکردنەوەو دروستکردنی خانوبەرە بەرەوپێش چووو، سەرباری هەموو ئەمانەش کەش‌و هەوا سەربازی‌و عەسکەرتاریەتە باوەکەی زۆرینەی سەردەمەکانی دەوڵەتی (ئومەوی) کاریگەری خۆی لەسەر پیشەسازی

---

١ التطور الاقتصادي في العصر الأموي (ص: ٢٠٩).

داناو لەم نێوەشدا پیشەسازی کەشتی بازرگانی گەشەی سەند.[1] (دەوڵەتی ئومەوی) بە مەبەستی وەستانەوە لە بەرانبەر (کەشتیرانی جەنگی دەریایی بێزەنتی) -کە هەڕەشەی لە هێمنایەتی کەنارە خۆرئاواییەکانی دەوڵەتی ئیسلامی دەکرد-، بایەخی بە دامەزراوەی کەشتیرانیە جەنگیەکەی خۆی دەداو، ئیتر پیشەسازی (کەشتی جەنگی) بە شێوەیەکی بەرفراوان‌و بەردەوام پەرەی سەند، ئەمەو لەسەرەتای سەردەمی ئومەویدا لە بواری پیشەسازیدا تەنها (کەشتی) دروست دەکران‌و هەتا ساڵی (٤٩)ی کۆچیش تەنها (مصر) بەرهەمی دەهێنان. ئەمجا (معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان) (خودا لێی ڕازی بێت) فەرمانیدا خانەیەکی پیشەسازی کەشتی لە شاری (عەکا)ی وڵاتی (شام) دابمەزرێنرێت، خەڵکانی پسپۆڕو شارەزای لە (مصر)ەوە بۆ هێنان‌و بە حوکمی ئەوە تەختەی کەشتیەکان کە لە داروباری چیاکانی لوبنان دروست دەکران کاروبارەکان بە سێنایی ڕایی دەبوون.[2] ئەمجا ئەم جۆرە پیشەسازیە بەرەو پێش چوو، تا ئەوەی لە ساڵی (٥٤)ی کۆچیدا ناوچەیەکی تازەی پیشەسازی تایبەت بە دروستکردنی کەشتی جەنگی کرایەوەو[3] دوابەدوای گوزەرکردنی سەردەمی (معاویە)ش (پیشەسازی کەشتی) پەرەی پێدراو، ناوچەکانی (پیشەسازی کەشتی جەنگی) بوونە چەند ناوچەیەکی نیشتەجێبوونی سەرنجڕاکێش‌و ڕازاوەو چەند ناوچەیەکی پیشەسازی هەمەلایەنەو بەرهەمهێن‌و بە پیت‌و بەرەکەت، بە چەشنێك چەندین هوتێل‌و موسافیرخانەو نانەواخانەو هاوێنەی ئەم شتانەیان تێدا دروست کرابوون‌و شەوق‌و زەوقیان بە پێشکەوتنی ئەم جۆرە پیشەسازیە (پیشەسازی کەشتی جەنگی) دەدا، کە هەر لە سەرەتای دامەزراندنیەوە بە ڕێکوپێکی‌و پڕ وردەکاری ناوی دەرکردبوو، دانانی سەرپەرشتیکارێکی گشتی بەسەر (ناوچەی پیشەسازی)یەوە بە ناوی (موتەوەللی صەناعە) یەکێك بوو لە وێنەی ئەو وردەکاریە ڕێکوپێکانەی بۆی ئەنجام درابوون، گرنگترین کارەکانی (سەرپەرشتیکاری گشتی پیشەسازی) بریتی بوو لە کۆکردنەوەی تەواوی وزەو توانا مرۆییە هونەریە چالاکەکانی ئەم بوارە لە: دارتاش‌و ئاسنگەرو هاوێنەکانیان بە وەستاو شاگردەکانیانەوەو کۆکردنەوەو هێنانیان لە ناوچەو هەرێمەکانی خۆیانەوە بۆ ناوچە پیشەسازیەکان، کارێکی تریشی بریتی بوو لە: پەیداکردنی کەرەستە خاوەکانی وەك:

---

١ التطور الاقتصادي في العصر الأموي (ص: ٢٣٥).

٢ خطط الشام (٥/٣٧)، النظم الاسلامية، إبراهيم العدوي (ص: ٣٥٥)، التطور الاقتصادي في العصر الأموي (ص: ٢٣٩).

٣ تأريخ الحضارة الاسلامية والفكر الاسلامي (ص: ١٦٦).

تەختەو بزمارو تەواوی کەرەستە پیشەسازیەکانی تر، لەسەر ئەمەوە دەکرێ بڵێین: ئەو ڕێکخستنەی کە بە ڕەگەزێك لە ڕەگەزەکانی بەرهەمهێنانی چاخی نوێ دادەنرێت، ڕەگوریشەکانی بۆ کەرتی پیشەسازی گشتی سەردەمی (ئومەوی)، یان (سەرپەشتیکاری پیشەسازی) ئەوکات دەگەڕێتەوە، هەروەها دیاریکردنی کرێی کرێکارانو دابینکردنی ژەمە خۆراکی ڕۆژانە بۆیان یەکێکی ترە لە وێنە پڕ وردەکاریەکانی ڕێکخستنە پیشەسازیەکەی دەوڵەتی (ئومەوی)، دەوڵەت سوور بوو لەسەر دابینکردنی ڕێوشوێنی پشوودانو، چەند یەکەیەکی نیشتەجێبوون بۆ کرێکارو وەستاو سەرپەرشتیکارانی پیشەسازی لەنێو چوارچێوەی ناوچە پیشەسازیەکەداو، هەوڵی نەهێشتنی جەورو چەوسانەوەی سەر کرێکارانی دەداو، بە خەم دیاریکردنی چەند یەکەیەکی تریش بوو بە خاتری خێراکردنو ڕێکوپێکترکردنی کەشتیە جەنگیەکان بەو شێوەی داوای دەکەن.[1]

دەرەنجام کەشتیرانی جەنگیی سەردەمی (ئومەوی) پێشکەوتنێکی گەورەو بەرفراوانی بە خۆوە بینی.[2] بێگومان پێشدا (دەوڵەتی بێزەنتی) لە بواری دەریاییدا زۆر لە پێش دەوڵەتی ئومەوی ئیسلامیدا بوو، بەڵام معاویە (خودا لێی ڕازی بێت) بە خاتری لاوازکردنیو پاشانیش لەنێوبردنی ڕێوشوێنو هۆکارگەلێکی گونجاوی گرتنەبەر.

لێرەدا وانەیەکی گەورە هەیەو، سەرکردەکانی ئوممەت بۆ زانینی ئاستی هێزی دوژمنو لایەنە زاڵەکانیو هەوڵدان بۆ خۆ گەیاندنەوە دوژمنو ئەمجا زاڵبوون بەسەریدا لە تەواوی بوارەکانی سەربازیو سیاسیو ئیعلامیو ئابووریدا، بۆ ئەمە دەتوانن پەندو وانە لەم سیاسەتە بەجێیەی معاویە وەربگرن، ئەمڕۆ کە بە چاوی خۆمان دەبینین دوژمنمان خاوەنی هێزێکی سەربازی گەورەو بێ ڕەزایەو لە هەموو بوارەکانی چەکی ئاسمانیو چەکی ناوەکیدا لە لوتکەدایە، لەم حاڵەتەدا پێویستە ئوممەت هەوڵی چارەسەرکردنی ئەمە بداتو دەرەنجام بتوانێت بەرەنگاری دوژمنەکەی ببێتەوە، لەسەر زانایانو ڕۆشنبیرانی ئوممەت پێویستە سەری خۆیان لە بەرانبەر ئەو گوشارە سیاسیو نەفسیو ئیعلامیانەدا دانەنەوێنن کە دوژمنان ئەنجامیان دەدەن، پێویستە حوکمی خودا لە بەرانبەر بەدەستخستنی ئەو چەکەی پێی دەوترێت: (چەکی کۆکڵ) ڕوون بکەنەوەو بخەنەڕوو، ئەم چەکە مەترسیدارە کە لە مێژەو بە بەردەوامی بەدەست دوژمنانەوەیەو توانای یەکلاییکردنەوەی جەنگە

---

١ النظم الاسلامية للعدوي (ص: ٣٥٤، ٣٥٥).

٢ التطور الاقتصادي في العصر الأموي (ص: ٢٤١).

سەربازیەکانی هەیە، وای لە دوژمنان کردووە خۆ بە زل‌و گەورە بگرن‌و کار بۆ تێکدانی دین‌و بیروباوەڕو کلتورمان بکەن‌و، دەست بەسەر سەروەت‌و سامان‌و دینماندا بگرن، هەموو ئەمانە واجبی دەکەن لەسەرمان کە بە گوێرەی ئەوپەڕی تواناو هێزەی هەمانە خۆمان بۆ بەرەنگاربوونەوەی دوژمن ئامادە بکەین، لەبەر ئەمەو لە پێناوی پاراستنی ئاسایشی وڵاتمان‌و دینمان‌و بەرپاکردنی دادپەروەری‌و چەپاڵەدانی مرۆڤایەتی لە بەرانبەر ستەمدا پێویستە خۆمان بە چەکە بەهێزو یەکلاکەرەوەکان چەکدار بکەین.

(پیشەسازی کەشتی بازرگانی) یەکێکی تر بوو لەو پیشەسازیانەی لە سەردەمی ئومەویدا بەناوبانگ بوون، هەرچەندە کەشتیە بازرگانیەکان زۆر لە کەشتیە جەنگیەکان جیاواز نەبوون، بەڵام ناوچە پیشەسازیەکانیان لێك جیاواز بوون، هەرێمی (بەحرەین) لە هەموو هەرێمەکانی تر زیاتر کەشتی بازرگانی بەرهەم دەهێنان، ئەمە لە کاتێکدا (مصر)و (عەکا)و (تونس) مەڵبەندی دروستکردنی کەشتی جەنگی بوون، هەڵکەوتنی جوغرافی (بەحرەین) لەسەر شوێنێکی وەکو کەنداوی عەرەبی هاریکارێکی سەرەکی پیشەسازە کەشتیە بازرگانیەکەی دەکرد، چونکە گرنگترین ڕێبازی هاتوچۆی بازرگانی دەریایی نێوان خۆرهەڵات‌و خۆرئاوا بووو دانیشتوانەکەشی بە هۆی تێکەڵاوبوونیان لەگەڵ گەلانێکی وەکو گەلانی هیندو چین لە بواری دەریاوانیدا پسپۆڕ بوون شارەزاییەکی باشیان لەم بوارەدا پەیدا کرد،[1] پیشەسازی کەشتی بازرگانی لەسەر (بەحرەین) کورت هەڵنەهات، بەڵکو بەرەو شاری (واسیط)ی عێراق پەلوپۆی درێژکردنەوە. ئەم جۆرە پیشەسازیە بە شێوەیەکی تایبەت لە سەردەمی ویلایەتی (حجاج)دا گەشەی سەند.[2] ئەو لە ڕووی گەورەکردن‌و جوانکردن‌و ڕێکوپێککردنەوە گۆڕانکاری بەسەر کەشتی بازرگانیدا هێنا، بە خاتری ئەوەی ئەم کەشتیانە بتوانن بە ئاسانی بە پانایی دەریادا گوزەر بکەن فەرمانیدا: قەبارەی کەشتیەکان گەورەتر بکەن‌و بۆ زیاتر توندو تۆڵبوونیان بزماریان لێ دابکوترێن‌و گرنگی بە کەلەشی گەورەیان بدرێت.[3] ئەو کەشتیانەی لە (واسیت) دروست دەکران پێیان دەگوترا (واسیطی)، زیاد لەمەش کارخانەکەی (واسیط) کەشتی‌و بەلەمی بچکۆلەی وای بەرهەم دەهێنان کە بۆ گەشتوگوزارو گواستنەوەی کاڵا بازرگانیەکانی ڕێگە ڕووباریەکەی نێوان (واسیط)و (بەصرە)

---

١ البحرين في صدر الاسلام، عبدالرحمن نجم (ص: ٨٤).

٢ العلاقات التجارية بين دول الخليج وبلدان الشرق الأقصى (ص: ١٠١).

٣ التطور الاقتصادي في العصر الأموي (ص: ٢٤٢).

بـشێن، كـە بێگومـان ئـەم كارانـە بـە كەشـتی گـەورە ئـەنجام نـەدەدران.[١] هەرچـەندە مەڵبەنـدەكانی بەرهـەمهێنانی كەشـتی خۆرهـەڵاتی دەوڵـەتی (ئومـەوی) بـە دروسـتكردنی كەشتی بازرگانی ناویان دەركردبوو، بەڵام تەنها بەم جۆرە كەشتیانەوە تایبـەت نـەكرابوون، بەڵكو توانایەكی دوور بەرانبەری هەبوو، (حەججاج) لـە سـەردەمی ویلایـەتی خۆیـدا هێزێكـی سەربازی دەریایی لەسەر (كەنداوی عەرەبی)و (دەریای هیندی) دامەزراند.[٢]

## شەشەم: چەند گومانێك لەسەر خەرجكردنی سامان لە سەردەمی (معاويه)دا:

مێژوونووسـانێك ژمارەیـەك گومانیـان سـەبارەت بـە خـەرجكردنی سـامان لەسـەردەمەی (معاويه)دا ورووژاندووەو هاتوون هەندێك خەرجیان باس كردووەو گوتوویانـە كـە ئـەم جـۆرە خەرجیانە ناشەرعی‌و ستەمكارانەن، هەندێك لەو گومانانە:

١ـ زیادەڕەوی كردن لە وەرگرتنی باج‌و خەراج لە هەنـدێك هـەرێم‌و جیـاوازیكردن لـە موچەبەخشیندا:

أـ بەخشینی (مصر) بە (عەمروی كوڕی عاص) وەك پارویەكی گەرمونەرم:

چەند ڕیوایەتێك ڕادەگەیەنن كـە (معاويـه) وڵاتـی (مـصر)ی وەكـو پارویـەكی گەرمونـەرم بەخشیوە بە (عەمروی كوڕی عاص) لە كرێی ئەوە (عەمرو) لـە جـەنگی دژ بـە (عـەلی كـوڕی ئـەبو تالیـب)دا پـشتگیری بكـات، زۆرینـەی ئـەم ڕیوایەتانـە هەسـتی دوژمنكارانـەی دژ بـە (عـەمرو)و (معاويـە)یـان لـە خۆگرتـووەو وای دەخەنـە بەرچـاو كـە گوایـە: ئـەم دووانـە لـە چوارچـێوەی پیلانێكـی پەسـتو ڕێككـەوتنێكی پیـسدا لەسـەر جـەنگی دژ بـە (عـەلی) پێكهاتبوون‌و بەمە هـەردووكیان لـە بەرانبـەر كاڵاو پاتـاڵێكی بـڕاوەو سـەركەوتنێكی كەمـدا ناپاكیـان لـە بەرانبـەر پـەروەردگاریان‌و دینیـان‌و مێـژووی خۆیانـدا ئەنجامـدا، ئـیتر گوایـە (عەمروی كوڕی عاص) بەبێ وەرگرتنی پۆستی ویلایەتی (مـصر)و خـواردنی بـاج‌و خـەراجی ئەو وڵاتە مەحاڵ بێ پشتیوانی لە داوایەك بكات كە هەزاران پیاوی خەڵكی (شام)و شـوێنانی تری بۆ ڕاست بوونەوە، –كـە خـۆی لـە (داوای تۆڵـەی خـوێنی عوسمـان)دا نیـشاندا دەدا–، هەندێك لەو ڕیوایەتانە جنێـوو قـسەی قێزەونیـان بـۆ ئـەم دوو هاوەڵـە مەزنـە لـەخۆگرتووە، دەڵێن گوایە (عـەمرو) پۆسـتی ویلایـەتی (مـصر)ی بەسـەر خۆشـی‌و جوانیـەكانی قیامەتـدا

---

١ الحجاج بن يوسف الثقفي (ص: ٥٩)، هزاع الشمري.

٢ (واسط) في العصر الأموي (ص: ٢٤٣).

هەڵبژاردووەو بە دەمی خۆی گوتوویەتی: ئێمە تەنها ئەم دونیایەمان مەبەست بووە،[١] یان گوایە بە معاویەی گوتبێت: هەتا لە دونیاکەت بەشم نەدەی لە دینەکەمت پێ نادەم.[٢] یان گوتبێتی: تەنها بە دینەکەم ئەوێ (مصر)ت لێ دەکڕم.[٣] یان پێی وتبێ: ئەگەر (مصر)و پۆستی ویلایەتەکەی نەبوایە خۆم ڕزگار دەکرد، من چاك دەزانم (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) لەسەر هەقەو تۆش لە دژی ئەو وەستاوی.[٤] ئەمەو چەند ڕیوایەتگەلێکی تریش‌و[٥] ژمارەیەك گوتەو حیکایەتی هەڵبەستراوو بێ بنەما لە کتێبەکەی (المسعودی)و کتێبی (الامامة والسیاسة)ی پاڵدراو بۆ لای (إبن قتیبه)و چەند کتێبێکی تریشدا کەڵەکە کراون‌و، گۆڕانێکی وایان بەسەر (عەمروی کوڕی عاص)دا هێناوە، کە کەسایەتیەکی دنیاپەرست‌و بەرژەوەندچی‌و تەماعباز بووبێت، دەستەیەك لە نوسەران‌و مێژوونووسان بە هۆی ئەم جۆرە ڕیوایەتە لاوازو هەڵبەستراوو نەخۆشانەوە کاریان تێکراوەو بەمە (عەمرو)یان لە لوتکەی بەرزی کەسایەتی خۆیەوە بەرەو خواری خوار هەڵداشتووە، وەکو ئەوەی (محمود شیت خطاب)[٦] و (عبدالخالق سیِّد أبو رابیة)[٧] نوسیویانەو، (عباس محمود العقاد)یش وێڕای باسکردنی، لوتی خۆی لە بەرانبەر تەماشاکردنی سەنەدەکانیاندا بەرز دەکات‌و پێی وایە کەسێك حیساب بۆ سەنەدەکان بکات پەست‌و نزمەو، ئەمجا (معاویە)و (عەمرو) (خودا لێیان ڕازی بێت) بە جۆرێك وێنا دەکات کە: دوو کەسی هەلپەست‌و بەرژەوەندخواز بوون، ئەگەر بێتو ڕەخنەگرە مێژووییەکان لە ئاقاست بێ بنەمابوونی ئەو ڕیوایەتانەی (عەقاد) لە لێکۆڵینەوەکەیدا پشتی پێ بەستوون یەك بگرن ئەوا هیچ واتایەك بە دەست (عەقاد)ەوە نامێنێت، پاش هێنانی ئەم ڕیوایەتە لاوازو هەڵبەستراوانە (کە دروست نیە بکرێنە بەڵگە) دەڵێت: با ڕەخنەگرە مێژووییەکان ئەوەی لە دەستیان دێ لە بەرانبەر ڕاستی‌و ناڕاستی ئەم ڕیوایەتانە بیکەن‌و بیڵێن، ئەمە دەقێکەو گومانی تێدا نیە، خۆ ئەگەر هەموو مێژووەکان کۆك بن لەسەر ناڕاستی ئەمەو دژایەتی بکەن: (ئەوا هەر دەڵێم) ڕێکەوتنی نێوان ئەم دوو پیاوە

---

١ الدولة الأموية المفترى عليها، نقلا عن الكامل في التأريخ.

٢ الامامة والسياسة (١/٩٨).

٣ القعد الفريد (٤/٣٤٥).

٤ مروج الذهب (٣/٢٩).

٥ وقعة صفين (ص: ٢٣٧)، زنجیرەی ئەم ڕیوایەتانە هەموویان شیعەی ڕافیزەن.

٦ سفراء النبي (ﷺ)، (ص: ٥٠٨).

٧ عمرو بن العاص، لعبد الخالق سيد أبو رابية (ص: ٣١٦).

ڕێککەوتنێکی سازشکارانە بوو، لەسەر پۆستی دەسەڵات‌و ویلایەت یاریدەی یەکتریان کرد، سازش‌و پێکهاتنی هەردووکیان لەسەر ئەو بەشە دیاریکراوە بوو کە هەردووکیان قەولیان لەسەر دابوو، ئەگەر ئەمە لە نێوانیاندا نەبووایە هەرگیز ئەم دووە ڕێك نەدەکەوتن.[1]

لێرەدا بەڵگەگەلێکی زۆر هەن بەرپەرچی هەموو ئەو ڕیوایەتە لاواز‌و هەڵبەستراوانە دەدەنەوە کە برەویان پێدراوە‌و بە شێوەی جەور‌و ستەم‌و بوختان بازاڕی دژ بە (عەمروی کوڕی عاص)و (معاویە)یان پێ گەرم کراوە‌و سەر‌و سوڕەتی ئەوانیان بە ناڕەوا پێ شێوێنراوە، ئەم بەڵگانە دەری دەخەن کە ئەم دوو هاوەڵە لەو ڕۆژەوە کە موسڵمان بوون: بە شێوەیەکی ڕاست‌و دروست موسڵمان بوون‌و بوونە هەڵگری مەشخەڵی تەقوا‌و پارێزکاری‌و مێژوویان پڕشنگدارە‌و پڕیەتی لە خزمەتکردن بە ئیسلام‌و موسڵمانان،[2] بۆ (معاویە) ئەم نزایەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) بەسە کە دەفەرموێت: ((أللهم اجعله هادياً مهدياً، واهد به))[3] واتە: خودایە (معاویە) بگێڕی بە کەسێکی ڕێنماکراو‌و ڕێنماکەر‌و بە هۆی ئەوەوە خەڵکانی پێ بێنە سەر ئاینی ئیسلام، هەروەها پێغەمبەری خودا (ﷺ) بۆی پاڕاوەتەوە‌و فەرموویەتی: ((اللهم علم معاوية الكتاب والحساب، وقه العذاب))[4] واتە: خوایە (معاویە) فێری قورئان‌و ژمێرە بکەیت‌و لە سزاش بیپارێزە. بەڵام سەبارەت بە (عەمروی کوڕی عاص) (خودا لێی ڕازی بێت)، پێغەمبەری خودا (ﷺ) شاهێدی (ئیمان)ی بۆ داوە‌و فەرموویەتی: ((أسلم الناس، وآمن عمرو بن العاص))[5] واتە: خەڵك ئیسلام بوو بەڵام (عەمروی کوڕی عاص) ئیمانی هێنا، لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: ((إبنا العاص مؤمنان: عمرو وهشام))[6] واتە: هەردووك کوڕەکەی (عاص) (عەمرو)و (هوشام) ئیماندارن. هەروەها پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: ((... وصدق عمرو، إن لعمرو عندالله خيراً كثيراً))[7] واتە: (عەمرو) ڕاستی گوت: بێگومان خێروبێرێکی زۆر لە لای خودا بۆ (عەمرو) پەسەندەکراوە.

---

١ عمرو بن العاص، للعقاد (ص: ٢٣١، ٢٣٢).

٢ الدولة الأموي، حمدي شاهين (ص: ٤١٦).

٣ صحيح سنن الترمذي للألباني (٣/٢٣٦).

٤ موارد الظمآن (٧/٤٩).

٥ سلسلة الأحاديث الصحيحة (للألباني).

٦ الطبقات (٤/٩١)، السلسلة الصحيحة (١/٢٤٠)، رقم (١٥٦).

٧ المستدرك (٣/٤٥٥)، صححه الحاكم، وقال الذهبي: صحيح إسناده حسن.

(عەمرو) لە سەردەمی (عەلی کوڕی ئەبو تالیب)دا تەنها لەسەر سەندنەوەی تۆڵەی خوێنی (عوسمـان) بەیعـەتی بـە (معاویـە)دا، کـوژرانی (عوسمـان) کاریگـەری گـەورەی لەسـەر دڵ‌و دەروونی دانا، کاتێك ئەم هەواڵەی بیست، بە پیادەو بە گریانەوە بـەرەو (شـام) بەڕێکـەوت‌و دەیگوت: (وای بۆ (عوسمان)، هەی شـەرم‌و شـکۆ ڕۆ، وەی دیـن‌و ئیمـان ڕۆ). بـەم شـێوەیە نەگیرسایەوە هەتا گەیشتە دیمەشق.[1]

(عەمرو) نزیکترین هاوڕێ‌و دەستەبراو ڕاوێژکاری (عوسمـان) بـوو، لـە سـەردەمی ئـەوداو بـەبێ ئـەوەی پۆسـتی (ویلایـەتی) بـە دەسـتەوە بـێ دەچـووە نێـو کـۆڕی ڕاوێـژکاری (عوسمان)ەوە، پاش ئەویش چووە شام تا لەگەڵ معاویە پـشتی یـەکتر قـایم بکـەن‌و تۆڵـەی خەلیفەی شەهید لە بکوژەکانی (عوسمـان) بسێننەوە.[2] (کـوژرانی عوسمـان) بـەس بـوو بـۆ (عەمرو) بخرۆشێت‌و تووڕەیی خۆی بخاتەگەڕ لە دژی تاوانبـارانی خوێنرێـژ بووەسـتێتەوە، ئەو پێویست بوو شوێنێك جگە لە (مەدینە) هەڵبژێرێت‌و لەوێوە تۆڵە لەو کەسانە بسێنێتەوە کە سنووری حەڕەمی ڕەسوڵی خودایان بەزاندووەو بە بەرچاوی خەڵکەوە خەلیفەکەی ئەویان کوشتووە، کەواتە غەریب نیـە (عـەمرو) بـۆ (عوسمـان) تـووڕە بووبێـت؟!، خـەڵکانێك هـەن تەمی گومان دەخەنە سەر ئەم بابەتەو تەوەری مـشتومڕیان لـە دەورەی چـەند ڕیوایـەتێکی درۆو هەڵبەستراو دەخولێتـەوەو وا نیـشان دەدەن کـە: هـەموو خـەم‌و مـەراقی (عـەمرو) بـۆ گرتنە دەستی جڵەوی دەسەڵات بووە.[3]

بەڵگەیەکی تر لەسەر پوچەڵبوونی بوختانەکە: (أبو مخنف) کە یەکێکە لە ڕیوایەتکـەرانی دەڵێت: ساڵی (٣٨)ی کۆچی معاویە سوپای خۆی بەرەو (مصر) بەڕێکردو لە ژێر دەسـەڵاتی پشتیوانانی (عەلی کوڕی ئەبو تالیب)یان دەرهێنا، (عەمرو) کە سەرکردەی پەلامارەکـە بـوو: ئاواتـەخواز بـوو ئەگـەر بەسـەر ئـەو وڵاتـەدا زاڵ بـوو ئـەوا بـە هـۆی زۆرو زەوەنـدی بـاج‌و خەراجەکەیەوە لە جـەنگی گـەڵ (عـەلی)دا بـراوە دەبێـت.[4] لێـرەدا دەپرسـین: چۆن معاویـە هەموو باج‌و خەڕاجی مصر دەبەخشێت بە معاویە کە لـە کاتێکـدا بـۆ خـۆی پێویـستی زۆری پێیەتی؟

---

١ تأريخ الطبري، نقلا عن عمرو بن العاص، للغضبان (ص: ٤٨١).
٢ عمرو بن العاص، للغضبان (ص: ٤٨٩، ٤٩٠).
٣ المصدر السابقة (ص: ٤٩٢).
٤ تأريخ الطبري (٦/٩).

بەڵگەیەكی تر: معاویە دوای وەرگرتنی پۆستی خیلافەت نامەیەكی بۆ (وردان)ی سەرۆكی دیوانی خەڕاجی (مصر) نوسی كە: بۆ هەر پیاوێكی (قیبتی) قیراتێكی لەسەر زیاد بكات، (وردان)یش بەم جۆرە وەڵامی دایەوە: چۆن وادەبێت؟ كە لە كاتێكدا بۆیان بە مەرج گیراوە نابێت لەسەریان زیاد بكرێت؟،[1] (وەك زانراوە) (وردان) تەنها لە سەردەمی ویلایەتی (عەمروی كوڕی عاص)دا پۆستی (باجو خەڕاج)ی (مصر)ی خراوەتە بەردەست، ئەو كەسانەش دوای مەرگی (عەمرو) ئەم پۆستەیان گرتۆتە دەست ئەمانە بوون: (عتبەی كوڕی ئەبی سوفیان، عقبەی كوڕی عامر، مسلمەی كوڕی خالد)، ئەمانە سەرپەرشتی نوێژو باجو خەڕاجی ئەو وڵاتەیان دەكرد، ئەم ڕیوایەتە بەڵگەیەكی ڕاستو ڕێكو ڕاشكاوەو دەری دەخات كە معاویە لە سەردەمی ویلایەتی (عەمروی كوڕی عاص)دا بایەخێكی زۆری بە زیادكردنو بەرەوپێشبردنی داهاتی (خەڕاج)ی (مصر) داوە، ئەگەر ئەم (باجو خەڕاجە) لە (مصر)ەوە بۆ (دیمەشق)و بۆ معاویە بەڕێ نەكرابێتو ئەو لە بوارە جۆراوجۆرەكاندا خەرجی نەكردبێت، ئەوا هەموو ئەو گرنگیدانانەی (معاویە) بە خاتری زیادكردنی (باجو خەڕاجی) مصر ئەنجامیداون بێ واتا دەمێننەوە.[2]

لە لایەكی ترەوە مەحاڵە معاویە دەستبەرداری دەوڵەمەندترین وڵاتی ئەو سەردەمەی ژێر دەسەڵاتی خیلافەتی خۆی بووبێتو بەسەرو پێوە ڕادەستی تاكە كەسێكی كردبێت، لە كاتێكدا كە زانیویەتی ئەمە موڵكو سامانی هەموو ئوممەتەو دەسەڵاتی بەخشینی نیە، (إبن تیمیة) لە (عطیەی كوڕی قەیس)ەوە دەگێڕێتەوە كە گوتوویەتی: (معاویە) وتاری بۆ دەداین، گوێم لێ بوو دەیگوت: دوای وەرگرتنی موچەكانتان لە (بیت المال)ە كەتاندا زیادە هەیەو بەسەرتاندا دابەش دەكەم،ئەگەر ساڵی ئایندەش زیادەمان بۆ هات هەر بەسەر ئێوەیدا دابەش دەكەم، ئەگەر نەبوو لۆمەم مەكەن، چونكە ئەوە ماڵی من نیە، بەڵكو ماڵی خودایەو بۆ ئێوەی گێڕاوەتەوە.[3]

جگە لەمەش: ئێمە ئەگەر زانیمان شارو وڵاتە ئیسلامیەكان كێبەركەی نێوخۆیان تێدا بووەو وڵاتێكی وەكو (مصر)یش كە تا دوێنێ لە ساڵی (٣٨)ی كۆچیدا (عەمروی كوڕی عاص) هاتۆتە نێویەوە هەوادارو شوێنكەوتووی (عەلی كوڕی ئەبو تالیب) بووە، چەند تاقمە

١ فتوح البلدان (ص: ٢١٩).
٢ الأمويون والفيء (ص: ٦٧، ٦٨)، فهمي عبدالجليل.
٣ منهاج السنة النبوية (١٨٥/٣).

نەیارێکی دژ بە دەوڵەتی (ئومەوی) تێدایە، زیاتر دڵنیا دەبین کە: دانیشتوانی (مصر) لەودەمەدا ئەوەیان پێ قبوڵ نەدەکرا هەموو خەراجی ولآتەکەیان ببەخشرێت بە (عەمروی کوڕی عاص) ئەویش وەکو ریوایەتکەرەکان دەڵێن هەڵی لوشێت، بۆ وێنە پیاوانێك لە مصردا هەبوون وەکو (عەمرو) پشتیوانی (معاویە)یان کردبوو، (معاویەی کوڕی حدیج)و هاوڕێ هەوادارەکانی (عوسمان)، ئەمانە بە هیچ کلۆجێك ڕازی نەدەبوون کەسێکی وەکو (عەمرو) بەم شێوە (باسلێکراوە) بەسەریاندا پەسەند بدرێت، وەکو پێشدا زانیمان کاتێك معاویە(عبدالرحمن کوڕی أم الحکم)ی خوشکەزای بە پۆستی ویلایەتەوە بۆ مصر نارد، (معاویەی کوڕی حدیج) نەیهێشت قاچی بخاتە نێو خاکی (مصر)ەوەو بەرەو (شام)ی گێڕایەوە، (معاویە)ش نەیتوانی (معاویەی کوڕی حدیج) تووڕە بکات.[١]

ب ـ خۆشبوون لە (خەراج)ی (دارا بجرد) بۆ (حەسەنی کوڕی عەلی):

هەندێك مێژوونووس پێیان وایە (معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان) قایل بووە دەستبەرداری خەراجی (دارا بجرد) بێ بۆ (حەسەنی کوڕی عەلی)و ئەو (٥) ملیۆن درهەمەشی بداتێ کە لە (بیت المال)ی (کوفە)دا هەیە، لە بەرانبەر ئەوەدا (حەسەن) پۆستی خیلافەتی ڕادەست بکات، ئیتر (حەسەن) توانی پارەکەی (بیت المال)ی (کوفە) بەرێ، بەڵام نەیتوانی دەست بەسەر (خەراج)ەکەی (دارا بجرد)دا بگرێت، چونکە خەڵکی (بەصرە) نەیانهێشت، (ئەو مێژوونووسانە) پێیان وایە ئەمە بە دەست لە پشتدانی (معاویە)یان لە دەستپێشخەری خودی بەصراییەکان بووە، ئەم ریوایەتە چاو لە بەرانبەر کەسایەتی بەرزی (حسن)و (معاویە) دەنوقێنێت‌و وای دەخاتەڕوو کە: ئەم دوو کەسە بە ناهەق لەسەر خواردنی سەروەت‌و سامانی موسڵمانان ڕێکەوتوون.[٢]

بێگومان ئەم ریوایەتە پوچەڵەو فڕی بەسەر ڕاستیەوە نیە، بەڵکو ئەوەی (صحیح) بێت ئەمەیە کە لە صەحیحەکەی (بوخاری)دا چەسپاوە کە: (حسن) بە (عبدالرحمن کوڕی سمرە)و (عبدالله کوڕی عامری کریز)ی نوێنەرانی (معاویە)ی گوت: ئێمەی ڕۆڵەکانی (عبدالمطلب) پشکمان لەو سامانەدا هەیە.... کێ کەفالەتی ئەمەم بۆ دەکات؟ وتیان: ئێمە بۆ ئەمە کەفیلین.[٣] لێرەدا (حسن) قسە لەسەر سامانێك دەکات کە لە پێش ئەم بارودۆخەدا

---

١ الدولة الأموية المفترى عليها (ص: ٤١٧).

٢ المصدر نفسه (ص: ٤١٧)، تأريخ الطبري (٦/١٦٥).

٣ البخاري، ك: الصلح (رقم: ٢٧٠٤).

ڕۆڵەکانی (عبدالمطلب) هەیانبووەو، مەبەستی ئەوەیە (معاویە) لێیان زەوت نەکاتو، باسی ئەوە ناکات لەمەولا (معاویە) بڕە پارەیەکی دیاریکراویان بۆ ببڕێتەوە،[1] (إبن أعثم) دەڵێت: (حسن) وتی: بەڵام سەبارەت بە سەروەتو سامان: ئەوا معاویە بۆی نیە لە (فيء)ی موسڵماناندا مەرجم بەسەردا بسەپێنێت،[2] وەکو زانراوە: وەرگرتنی داهاتی (خراج) یەکێکە لە کارەکانی دەوڵەتو سەبارەت بە ئەمە پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆ لە نێوان (حسن)و دانیشتوانی (بەصرە)دا نەبووەو، خودی ڕیوایەتەکەش ئاماژە بەوە دەکات کە لە ڕستەی ئەو سامانە نەبووە کە پێشکەش بە (حسن) کراوە.[3] گێڕدراوەتەوە کە (حسن) بە (معاویە)ی گوتووە: من بەڵێنو قەرزێکی زۆرم لەسەر کەڵەکە بووە، (معاویە)ش بڕی (٤٠٠) چوارسەد هەزار درهەم یان زیاتری لە (بیت المال) بۆ دەرهێناو پێشکەشی کرد.[4] (إبن عساکر)یش باسی کردوە کە: (بیت المال)ی کوفە عاید بە خۆی دەبیو قەرزەکانی لێ دەداتەوەو، بەڵێنەکانی سەری پێ دەباتەسەرو مافی خۆیو ئەندامانی خێزانو بنەماڵەکەی لێ هەڵدەگرێتو، خەرجی هەموو ئەوانەشی لێ دەردەکات کە لەگەڵیدان بە چەشنێك، بەشی خۆیو ئەندامانی خێزانەکەیو خاووخێزانی باوکیو کوڕو کچەکانی دەدا.[5] هەندێك مێژوونووس دەڵێن: بڕی (٥) پێنج ملیۆن درهەمی لە (بیت المال)دا هێشتنەوەو بەسەر ئەو جەنگاوەرانەیدا دابەش دەکرد کە لەگەڵیدا بوونو پێویستی ژیانی خۆیو کەسو کارو هاوەڵانی بوو.[6]

بێگومان دابەشکردنی سامان بەسەر هاوڕێو سەربازەکانی گەڵ خۆی دەبووە مایەی ئاسایی بوونەوەی بادودۆخو دابەزینی ئاستی گرژیو ئاڵۆزی، ئەوەی لە ڕیوایەتەکەی (بوخاری)دا هاتووەو تەنها لە ئەوە تێپەڕ ناکات کە (حەسەن) نایەوێت چاو لە ڕاست ئەو سامانەدا بنوقێنێت کە لە ڕۆژگاری ڕابردوودا دەست خۆیو کەسوکاری کەوتووە، بەڵام ئەو ڕیوایەتانەی ئاماژە بەوە دەدەن کە (معاویە) ساڵانە یەك ملیۆن درهەم بۆ (حسن) بنێرێتو، دوو ملیۆن درهەم بۆ (حسین)ی برای بەڕێ بکاتو لە بەخشینو موچەدا (بەنی هاشم) بەسەر

---

١ دراسة في تأريخ الخلفاء الأمويين (ص: ٦٤).
٢ الفتوح (٣/٢٩٣).
٣ دراسة في تأريخ الخلفاء الأمويين (ص: ٦٤).
٤ تأريخ الإسلام، عهد معاوية (ص: ٧).
٥ تأريخ دمشق (١٤/٩٠).
٦ في التأريخ الاسلامي، شوقي أبو خليل (ص: ٢٦٨).

(بەنی عبدشمس)دا هەڵبژێرێتو،[١] هەروەکو ئەوە (حسن) خیلافەتی بە معاویە فرۆشتبێت، ئەم ڕیوایەتگەلەو توێژینەوەو لێکدانەوەکانی سەریشیان قابیلی قبوڵ نینو پشتیان پێ نابەسترێت، چونکە وا نیشان دەدەن کە (حسن) هەستو نەستی بە چەشنێك بووە بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی خۆی بەسەر بەرژەوەندیە باڵاکانی ئوممەتدا هەڵبژاردوون،[٢] بەلام سەبارەت بەوە کە مافی موچەی لە (بیت المال)دا هەبێت ئەوا ئەو کەسێك نەبووە هیچی لە ئەندامانی ئەم ئوممەتە کەمتر بووبێت تا ئەوەی پێ ڕەوا نەدیترێ، هیچ ڕێگریش لە گۆڕێدا نین کە پشکی لە خەڵکانی تر زۆرتر بووبێت، بەڵام ئەو موچەیەی بۆی دانراوە خۆی لە دەیەکی یەك لەسەر دەی ئەو برە نادات کە ڕیوایەتەکان گوتوویانە.[٣]

ج ـ جیاوازی موچە:

(عومەری کوڕی خەتاب) (خودا لێی ڕازی بێت) یەکەم کەس بوو لە ئیسلامدا دیوانی (موچە)ی دامەزراند، لە سەردەمی پێغەمبەری خودا (ﷺ)دا دەستکەوتەکانی جەنگ دوای کۆتایی هاتنی جەنگەکە دابەش دەکران،[٤] پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە جەنگی (حونەین)دا دەستکەتەکانی ئەو جەنگەی بەسەر تازە موسڵمانبووە دڵنەوازەکان (المؤلفة القلوب)دا دابەشکرد، کە سامانێکی ئێجگار زۆر بوو،[٥] بەمە بڕیاریدا کە هەڵبژاردنی خەڵکانێك بەسەر خەڵکانێکدا لە دابەشکردنی دەستکەوتەکاندا ڕێگەی پێدراوەو خۆ ئەگەر بەرژەوەندی گشتی موسڵمانان ئەمە بخوازێت ئەوا حوکمی سوننەت (إستحباب) وەردەگرێت،[٦] ئەمە لە حاڵێکدا دەستکەوتەکان لە جەنگاوەرەکان زیاد بن، ئیتر لە سەردەمی (عومەری کوڕی خەتاب)دا غەزاو فتوحاتی ئیسلامی بەرفراوان بوو و، دەستکەوتێکی ئێجگار زۆرروزەوەند بەرەو مەڵبەندی حکومەتی ئیسلام دەهێنرایەوە، (عمر) سەبارەت بە ئەمە پرسی بە هاوەڵانی کرد، لە کۆتاییدا گەیشتە ئەو ئەنجامە تۆمارێك بۆ (دیوانی موچە) دابنێتو، بەمە دابەشکردنی ئەم سەروەتو سامانە بە بەرنامە ڕێك بخات، هات لە دیاریکردنی موچەدا موسڵمانە پێشینە

---

١ الاخبار الطوال (ص: ٢١٨).

٢ دراسة في تأريخ الخلفاء الأمويين (ص: ٦٣).

٣ المصدر نفسه.

٤ الدولة الأموية المفترى عليها (ص: ٤١٨).

٥ الاستخراج لأحكام الخراج (ص: ٢٦)، إبنه رجب الحنبلي .

٦ الدولة الأموية المفترى عليها (ص: ٤١٨).

دەستپێشخەرەکانو خزمە نزیکەکان (ی پێغەمبەری خودا -ﷺ-)ی خستە ڕیزی پێشەوەو زیاتری بۆ دیاریکردن.[1]

کاتێکیش (ئومەوی)یەکان هاتن، خەڵکانی (شام)یان دەخستە پێشەوەو زیاتریان بۆ حیساب دەکردن، لە ڕاستیدا (خەڵکی شام) پشتیوانی دڵسۆزیان بوونو لە هەردووك بەرەی جیهادی (ڕۆم)ی خۆرئاواو (ئەفریقیاو ئەندەلوس)ی خۆرئاواوە بڕبڕەی پشتی سوپا غەزاکەرەکەیان بوونو، پاسەوانو پارێزەری هێمنایەتی بادرودۆخی دەوڵەتیانو سەرکوتکەری نەیارەکانیان بوون، چەندین جار والی هەرێمەکان سوپاکانیان لە بەرانبەر شۆڕشچیەکانیان دەستەپاچەبوونو ناچار بۆ دەربازبوون لەمە هانایان بۆ سوپای (شام) بردووەو دەرەنجام ڕزگاریان کردوون، سەرکوتکردنەوەی شۆڕشەکەی (إبن الأشعث)[2] و ڕووبەڕووبوونەوەی شۆڕشەکەی (یزید کوڕی مهلب) لە سەردەمی (یزیدی کوڕی عبدالملك)[3]داو تەفروتوناکردنی بەرپەرە یاخیبووەکانی (ئەفریقیا) لە سەردەمی (هشام)[4]دا بە نموونەی ئەمە باس دەکرێن.

٢- بەخشینی سەخاوەتمەندانەی سامان بۆ ڕاگرتنی دڵانو ڕاکێشانی پشتیوانان:

معاویە (خودا لێی ڕازی بێت) بە ئامانجی ڕاگرتنو یەکخستنی دڵی سەرۆکهۆزەکانو جێگیرکردنی پایەکانی دەوڵەتی ئیسلامیو ئاساییکردنەوەی بارودۆخەکانو تێپەڕاندنی سەردەمەکانی براکوژیو ململانێ، بە شێوەیەکی سەخاوەتمەندانە دەستی بە دابەشکردنو بەخشینی سەروەتو سامان کرد، ئەو (خودا لێی ڕازی بێت) پێی وابوو هەڵڕشتنی هەندێك سەروەتو سامان لە ڕشتنی زۆرێك لە خوێنی موسڵمانان باشترە، جا بۆ ڕاکێشانی دڵی خۆیانو شوێنکەوتووو پشتیوانەکانیانو پڕکردنەوەی کونو کەلێنی پێداویستیەکانیانو بڕینی بڕوبیانووەکانیان، هات سامانی بەم سەرۆکهۆزو پیاوماقوڵانە دەداو پلەو پایەی بەرز دەکردنەوە، لەوانەیە (معاویە) لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) حاڵی بووبێت کاتێك (مەککە)ی فەتح کرد بە ئامانجی ڕاکێشانی خەڵکانی تازە موسڵمان بووی دڵنەواز بەرەو دینو، ڕاماڵینی گەمڕەی سەر دڵو دەروونیان سەروەتو سامانی پێ بەخشین، لەمەوە بۆی دەرکەوتووە کە کارێکی دروستو ڕەوایە وێنەی ئەم جۆرە کەسانە بە پارەو سامان دڵیان ڕابگیرێتو

١ الدولة الأموية المفترى عليها (ص: ٤١٨).
٢ تأريخ الطبري، نقلا عن الدولة الأموية المفترى عليها (ص: ٤٢٠).
٣ المصدر نفسه (ص: ٤٢٠).
٤ المصدر نفسه (ص: ٤٢٠).

پشتیوانیان بۆ ئیسلام مسۆگەر بکرێت، بە لای (معاویە)و (بنی أمیة)وە پشتیوانیکردن لە دین‌و دەوڵەت تێکەڵن‌و جیاواز نین، چونکە بە بیروباوەڕی خۆیان دەوڵەتەکەیان بە خاتری سەرخستنی دین‌و یەکخستنی خەڵکی ئەو دینە بەرپا بووە.[1]

لە کۆتاییدا: ئەگەر معاویە لەم کردارەیدا هەڵەش بوو بێت، باشە قسە چیە لەسەر ئەو هەموو خەڵکە بەرێزو شکۆدارانەی خەلاتو بەخشینەکانی ئەویان قبوڵ کردووە، خەڵکانێك لەنێو ئەم خەلات وەرگرانەدا هەبوون لە سیفەتەکانی پارێزو ترس لە خودا بەناوبانگ بوون؟

هەق وایە بڵێین: کۆمەڵگای ئیسلامی ئەو سەردەمە لەچاو کۆمەڵگای سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)و خەلیفە ڕاشیدەکانیدا گۆڕانێکی گەورەی بەسەردا هاتبوو و، هەڵسوکەوت‌و چالاکی سیاسی‌و ئیداری بە مافی خۆی دەزانی لە پێناو ڕاگرتنی هاوسەنگی‌و دادپەروەری کۆمەلایەتیدا جیاوازی بخاتە نێو موچەی تاکەکان.[2]

٣ـ دیاردەکانی خۆشگوزەرانی لە لای ئومەویەکان:

مشتومڕ سەبارەت بە خۆشگوزەرانی‌و دەستبلاوی ئومەویەکان بە لای مێژونووسەکانمانەوە ڕووبەرێکی فراوانی داگیرکردووە، لە ڕاستیدا بە لای ئەوانەوە ئەم چەشنە ژیانە لە ڕووی خانوبەرەیان‌و بەرگ‌و پۆشاکیان‌و بەخشین‌و خەرجیەکانیانەوە جۆرێکە لە جۆرەکانی دەستبلاوی‌و کەشخەلێدان، کاتێك (عومەری کوڕی خەتاب) (خودا لێی ڕازی بێت) سەری لە (شام) داو ویلایەتەکانی کردنەوە یەك، معاویە بەرەبەیان بە کەژاوەیەکی گەورەو ڕازاوەی ئەسپسواری دەردەچوو دەمەو ئێوارەش بە جۆرە کەژاوەیەکی ترەوە دەگەڕایەوە، معاویە بەم ڕەفتارەی سەرنجی عومەری بە لای خۆیدا ڕاکێشاو سەرسامی کرد، بەلام هەق وایە بەو جۆرە تەماشای ژیانی ئومەویەکان نەکەین کە ئەوان لە ژیانی کۆمەڵگای عەرەبی ئیسلامی ئەو کاتە دابڕابن، بێگومان ئەوان پارچەیەکی نەپچراوی ئەو کۆمەڵگایە بوون، چۆن کاریان تێدا دەکرد، بە هەمان جۆر کۆمەڵگاش کاری لە ئەوان دەکرد، لەو سەردەمەدا ڕەوڕەوەی کۆمەڵگا خێرا دەخولایەوەو لە گەشەدا بوو، دیاردەکانی دەوڵەمەندی‌و هەڵڕژانی سەروەت‌و سامان‌و ئارەزوو چوونە سەر ڕابواردنی حەلاڵ بە شێوەیەك زەق بیوونەوە کاریگەریان لەسەر زەوقی خەڵکی عامەو دابونەریتی کۆمەڵگای حوکمڕانی ئەو سەردەمە دادەناو بەرەو کرانەوەو فراوانی زیاتریان پاڵدەنا، ئەم نیشانە

١ الأمويون والفيء (ص: ٧٢، ٧٣)، الدولة الأموية للشامين (ص: ٤٢٢).
٢ الدولة الأموية المفترى عليها (ص: ٤٢٢).

دیارە لە لایەن چەندین هەواڵی ڕاست‌و چەسپاوەوە سەبارەت بە دنیانەویستی (معاویە)و تەنکی پۆشاکیەوە،[1] یان دنیانەویستی (زیاد) کاربەڕێوەبەری (عێراق)ی‌و پۆشاکی پینەکراویەوە[2] دژایەتی ناکرێت، بەڵکو هیچ دژایەتیەك لە نێوان ئەم جۆرە ڕیوایەتانەو خۆدەرخستن لە پۆشاکی شاهانەی ئەواندا نیە، بەڵکو ئەوە بەڵگەیە لەسەر جۆرە نەفسبەرزیەك کە (دونیانەویستی) بە کەموکوڕی دانانێت‌و، (خۆشگوزەرانی سنوردارکراو)یش بە حەرام سەیر ناکات.[3] هەروەها ئەگەر بە شێوەیەکی گشتی سەیرێکی لایەنی خەرجکردنی سەروەت‌و سامان‌و دەستبلاوی لەو سەردەمەدا بکەین بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم دیاردەیە بەس لەسەر خەلیفەو کاربەڕێوەبەرەکانی (ئومەوی) کورت هەڵنەهاتووە، خەڵکانێك لە تیرەکانی (بەنی هاشم)و ((بەنی زوبێر)و هی تریش هەبوون کە بەرهەڵستکاری (ئومەوی)یەکان بوون نە لە ڕووی خەرجکردنەوە لە ئەوان کەمتر دەستبلاوبوون، نە لە ئەوان زیاتر داکۆکیان لێ دەکرد،[4] ئەگەر (ئومەویەکان) کۆشك‌و تەلارانێکیان دروست کردبن، خۆ پیاوانێکیش لە پیاوماقوڵانی (عەرەب) هەبوون‌و چەندین کۆشك‌و تەلاریان بەرزکردبوونەوەو بۆیان ببوونە مایەی ناوبانگ دەرکردن‌و شانازی، (عەرەب) خانوبەرەی گەورەیان بە نیشانەی سەخاوەت‌و دڵاوایی حیساب دەکردو شانازیان پێوە دەکرد، پێیان وابوو هەر کەسێك شکۆدارو پیاوماقوڵ‌و خانەدان بێت ئەگەر (حوکمڕان)یش نەبێت دەبێت خاوەنی باڵەخانەو دیوەخان بێت.[5]

خۆشگوزەرانی لەنێو کۆمەڵگا ئیسلامیەکاندا دیاردەیەکە شوێنەواری خراپ لە دوای خۆیەوە بەجێ دێڵێت، بێگومان دەست بلاوی ئومەویەکان لە میانەی خەرجکردنی ساماندا سەری بۆ دەرکەوتنی دیاردەی خۆشگوزەرانی کێشا، ئەمجا ڕەگوڕیشەی لەنێو ئومەتدا داکوتان‌و دەرەنجام جۆرە خۆشگوزەرانیەکی ڕمێنەری لێ دەرچووو نیشانەو شوێنەوارەکانی خۆی بەسەر ڕوخانی وڵاتی (شام) لەسەر دەستی خاچپەرستان‌و، ئەمجا ڕوخانی (بەغدا)و کۆتایی پێهێنرانی دەوڵەتی عەباسی لەسەر دەستی (مەغۆلەکان) بە دەرکەوتن، لەبەر ئەمەیە (ئیسلام) ڕقی لە خۆشگوزەرانییەو بە توندترین شێواز خەڵکی لێ ئاگادار دەکاتەوە:

---

١ العواصم من القواصم (ص: ٢١٧)، تعليق محب الدين الخطيب.
٢ تأريخ الطبري، نقلا عن الدولة الأموية المفترى عليها (ص: ٤٢٤).
٣ الدولة الأموية المفترى عليها (ص: ٤٢٤).
٤ المصدر نفسه (ص: ٤٢٤).
٥ المصدر نفسه (ص: ٤٢٥).

﴿ وَإِذَآ أَرَدۡنَآ أَن نُّهۡلِكَ قَرۡيَةً أَمَرۡنَا مُتۡرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيۡهَا ٱلۡقَوۡلُ فَدَمَّرۡنَٰهَا تَدۡمِيرٗا ﴿١٦﴾ ﴾[1] واتە: ئەگەر ویستمان خەڵکی گوندێك لەنێو بەرین، فەرمانمان بە خۆشگوزەران و دەستڕۆیشتووەکانیان دەکرد بەندایەتی بۆ خودا بکەن و پەیڕەوی لە بەرنامەکەی بکەن، بەڵام ئەوان سەرپێچیان تێدا کردو سزای خودایان لەسەر چەسپا، جا گوندەگەمان ژێرەوژوور کرد، بێگومان چۆن تێزاب ڕەگەزەکانی مادده لێکهەڵدەوەشێنێت و ڕەقیەکەی لەنێو دەبات و شی دەکاتەوەو توانای بەرگریکردنی لێ دەستێنێتەوە، بە هەمان جۆر خۆشگوزەرانیش ئاوا ئەندامەکانی ئوممەت لێك هەڵدەوەشێنێت و هێزو پێزو وزەو توندوتۆڵی ودامەزراویەك کە هەیبووە پێی ناهێڵێ، لە ڕاستیدا زۆربوونی سامان بەدەست خەڵکەوە تاکە دەروازەی چوونە نێو ڕابواردن و خۆشگوزەرانیە، ئەمە دەکرێ ڕوونکردنەوەی دەربارە بکرێ بەڵام دروست نیە پاساوی بۆ بهێنرێتەوە، چونکە پاساوهێانەوە لە بەرانبەر سەرپێچیکردنی خودادا نایخوات، لە ڕۆژگاری (عمر)دا سەروەت و سامان بە شێوەیەکی ڕێژەیی هاتەبەردەست، بەڵام هەوڵی دا بە جۆرێك هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەو سامانەدا بکات سەری پێ لە گەندەڵی دەرنەچێت، بە خاتری ئەمە: نەیهێشت هاوەڵان (خودا لێیان ڕازی بێت) بە مەبەستی چوونە سەر زەوی و زاری کشتوکاڵی و بازرگانی لە شاری (مەدینە) دەربچن و دەرەنجام چینێکی سەرمایەداریان لێ دەربچێت و ببنە خاوەنی دەسەڵاتێکی (ئەدەبی وئەبەدی) بەسەر خەڵکەوەو، جیاکاریەك ڕوو بدات و بارودۆخەکان تێك بچن، وێڕای ئەمەش ئەو هاوەڵانە کە دەستەی ڕاوێژکاری (خەلیفە)ن، مەترسی ئەوەیان لێ دەکرا بە دەردی خۆشگوزەرانی و ڕابواردنەوە گرفتار ببن و هەوای سەودا سەری دنیا بچێتە کەللەیانەوەو ڕاوێژو مەشوەرەتەکەیان لێ تێك بچێت، لە پێش ئەمانیشەوە (عمر) (خودا لێی ڕازی بێت) ئەمەی بە توندی لە تاکتاکی ئەندامانی خێزانەکەی خۆی قەدەغە کرد، نەوەك ببنە پێشەنگێکی خراپ بۆ خەڵك و دەرەنجام خەڵکیش گەندەڵ ببێت.

کاتێك جڵەوی کاروباری سەروەت و سامان بە دەست سەرپەرشتیکاری مشورخۆرەوە دەبێت: دەروازەی سوودو قازانجەکەی لە بەردەم ئاوەڵا دەکات و ڕێگەش نادات زیان بگەیەنێت، بەڵام کاتێك ئەم ماڵە بێ سەرپەرشتیکارو زەبت و ڕەبت و بەرنامە وێڵ دەکرێت، ئەوا دەبێ بە گوێرەی سوننەتەکانی خودا سەر بۆ ئەنجامە حەتمیەکان بکێشێت، هەڵبەتە لەبەر ئەوە نا سامان بە خودی خۆی ئەم پەرێزە لە دوای خۆی بەجێ دێڵێت، بەڵکو لەبەر

---

[1] الاسراء (١٦).

ئەوەیە ئەو ئەرکەی لەسەر مرۆڤ دانراوە بۆ چاککردنی ئافەت‌و دەردی سامانەکە جێبەجێ نەکراوەو لە کۆتاییدا ئافەت‌و دەردەکە وەکو باڵادەستێکی دەستڕۆیشتوو ماوەتەوە، بێگومان دەردی سامان‌و خۆشگوزەرانی‌و ڕابواردنە، کاتێك سەرۆك یان سەرپەرشتیکاری گشتی گیانی جیددیەتی لەنێو کۆمەڵگادا بڵاوکردەوەو خۆی لەم ڕێگە سەختەدا کردە پێشەنگی خەڵك دەردەکە لەنێو دەچێت‌و چارەسەر ئەنجام دەدرێت، بەڵام کاتێك سەروەت‌و سامان بەبێ بەرنامەو چاودێر خرایە بەر دەستی خەڵك‌و، کۆمەڵێکیش هەبوو کاری بۆ تێکدانی ڕەوشتی کۆمەڵگا دەکرد (وەکو کۆمەڵێکی فارس لەنێو دەوڵەتی عەباسیدا کردی) ئەوە دەرەنجام بەپێی ئەو بڕیارو سوننەتانەی پەروەردگار کە کتێبی خودا دەری خستووە:

﴿ظَهَرَ ٱلۡفَسَادُ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ بِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِي ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعۡضَ ٱلَّذِي عَمِلُواْ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴿٤١﴾﴾[1]

واتە: بە هۆی کاری دەستی خەڵکەوە گەندەڵی‌و خراپەو بەدڕەوشتی لە وشکانی‌و تەڕایی(خاك ودەریا) دا سەری هەڵداو بڵاوبۆوە، بە خاتری ئەوە تۆبە بکەن‌و بۆ لای خودا بگەڕێنەوە هەندێك لە (تاڵاوی) بەرهەمی کردەوەکانیانمان لە گرانی‌و قاتوقڕی‌و نەهامەتی پێ چێشتن.

(خۆشگوزەرانی‌و ڕابواردن)یش وەکو هەموو دەردێکی تر تیراوە ئاسایەو ئەگەر خێرا چارەسەر نەکرێت تەشەنە دەکات‌و بڵاودەبێتەوە،..... کاتێك خەڵکانی نێو کۆشکەکانی خیلافەت دەبنە دەستپێشخەری ڕابواردن ئەمە هەر زۆر خراپتر دەبێت، چونکە هەمیشە حوکمڕانان پێشەنگن، ئومەویەکان هەرچەندە دیاردەی دەردی ڕابواردنیان تێدا هەبوو، بەڵام لەچاو عەباسیەکاندا سەبارەت بە خەرجکردنی سەروەت‌و سامان و بە فیڕۆدانی وگەندەڵی کەمتریان تێدا بوو، ئەوان لە لایەکەوە زیاتر بە سەقامگیرکردنی دەوڵەتەکەیانەوە خەریك بوون‌و لە لایەکی تریشەوە سەرگەرمی ئەنجامدانی جیهادو فتوحات بوون، بەڵام عەباسیەکان پاش ئەوە کاروباریان بۆ چەسپاو دەسەڵاتیان بۆ جێگیر بوو، ئیدی دەردی ڕابواردن‌و خۆشگوزەرانی بەخێرایی لەنێویاندا بڵاو بۆوە، بە تایبەتی داروودەستەیەکی نەتەوەی فارس لەنێو کۆشکی خیلافەتدا هەبوون‌و خەریکی گەندەڵکاری بوون، ئیدی ئەم دەردە لە کۆشکەکانی خیلافەتەوە بەرەو کۆشکی میرو وەزیرەکان گوازرایەوە، لەوێشەوە بەرەو تەلاری ئەو بازرگانانەی داهاتیان لە بازرگانی جیهانیدا خۆی لە چەندین ملیۆن دینار دەدا ، بەرەبەرە گەندەڵی هەمەلایەنە (بەغدا)ی پایتەختی (خیلافەت)ی داگیر کردو ئەمجا سەرەگەیشتە تەواوی مەڵبەندە ئیداریەکانی جیهانی ئیسلام.[2]

---

١ الروم (٤١).

٢ كيف نكتب التأريخ الاسلامي، محمد قطب (ص: ١٢٦، ١٢٧).

# باسی شەشەم

## دادوەری (القضاء) لە سەردەمی معاویە (خودا لێی ڕازی بێت)و دەوڵەتی (ئومەوی)یدا:

دوابەدوای دوو سەردەمی (پێغەمبەرێتی)و (ڕاشیدی)، (دادوەری)ی سەردەمی (ئومەوی) بە پلەی سێیەم دێت، چونکە ئەو سەردەمە ڕەنگاوڕەنگ بووو زۆرێك لە شوێنەوارەکانی سەردەمی (ڕاشیدی) تێدا هەبوون‌و زۆرێك لە چالاکی‌و کردارەکانی درێژەپێدەری ئەو سەردەمە بوون، بە تایبەتیش: لایەنی فتوحاتی ئیسلامی‌و پەخشکردنی بانگەوازی ئیسلام بە خۆرهەڵات‌و خۆرئاواداو پۆل پۆل موسڵمانبوونی خەڵك‌و گەشانەوەی شارستانێتی ئیسلامی.[1]

## یەکەم: پەیوەندی سەردەمی (ئومەوی) بە سەردەمی (ڕاشیدی)یەوە:

سەردەمی (ئومەوی) بە تایبەتی سەردەمی (معاویە) لە چەند لایەنێکەوە درێژبۆوەی سەردەمی (ڕاشیدی) بوو، زۆرێك لە هاوەڵان لەو سەردەمەدا لە ژیاندا مابوون، لە (زانست‌و فیقهو دادوەری)یدا بەشداری چالاکیەکانیان کردن، جگە لە ئەوانیش گەورە (تابعی)یەکان‌و (تابیعی)یە بچووکەکانیش هەبوون‌و لە مەیداندا بوون، هەروەها ژمارەیەك دادوەری سەردەمی (ڕاشیدی) کاروباری (دادوەری) سەردەمی (ئومەوی)یان ڕادەپەڕاندن، هەشیانبوو (دادوەری)یەکەی درێژەی کێشا، (شریحی کوڕی حارث) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) نموونەی ئەو دادوەرانەیە، لەو سەردەمەدا پەرێزی پەروەردەی دینی‌و بەرزڕاگرتنی ئیمان‌و عەقیدەو پابەندبوون بە حوکمەکانی شەرعەوە وەکو سەردەمی (ڕاشیدی) مابوونەوە، ژمارەیەك (موجتەهید) لەو سەردەمەدا سەریان هەڵداو بوونە ئاڵقەی پەیوەندی نێوان هاوەڵان‌و مەزهەبە فیقهیەکان، زاناو موجتەهیدەکانی ئەو سەردەمە مامۆستاو ئوستادی پێشەواو سەرمەزهەبەکان بوون کە لە سەردەمی (عەباسی)دا دەرکەوتن، ئەم سەرو سوڕەتە ڕەنگین‌و ڕازاوە فیقهیە کاریگەری گەورەو پیرۆزی لەسەر جوانبەڕێوەچوونی دادوەری‌و بەرپاکردنی دادپەروەری سەردەمی (ئومەوی) دانا، مەودای ئیجتیهادکردن بەرفراوان کراو گەشێنرایەوە، بزوتنەوەی نووسینەوەی زانستەکانی ئیسلام دەستی پێکرا، دەروازە لە ڕووی شارستانیەتەکان‌و وەرگێڕانی کلتورو زانستی نەتەوە هاوسێکاندا کرایەوە.[2]

---

١ تأريخ القضاء في الاسلام (ص: ١٦٥).

٢ تأريخ القضاء في الاسلام (ص: ١٦٥).

## دووەم: جیهێشتنی پۆستی دادوەری لە لایەن خەلیفەکانەوەو جیاکردنەوەی دەسەلاتەکان:

خەلیفە (ڕاشیدی)یەکان بە خودی خۆیان سەرپەرشتی (دادوەری)یان دەکردو، کێشەو سکالاو بگرەو بەردە کۆمەڵایەتیەکانیان چارەسەردەکردن‌و تا ئەوەی هەریەکێك لە ئەوان قەزاوەتگەلێکی زۆری ئەنجامداوە، کاربەڕێوەبەری هەرێمەکانیش بە حوکمی ئەوە جێگری (خەلیفە)ن، هەمان دەسەلاتی خەلیفەیان هەبووو کاروباری (دادوەری)یان ئەنجام دەدا، مەگەر لە حاڵێکدا هەندێکیان ئەنجامدانی ئەم کارەیان لێ قەدەغە کرابێت‌و بە هامرای ئەوان دادوەرانێك بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی خەڵك دامەزرێنرابن، معاویە یەکێك بوو لەو کاربەڕێوەبەرانەی ماوەی (٢٠) ساڵ بە خودی خۆی حوکمڕان‌و دادوەری وڵاتی (شام) بوو،[١] کاتێکیش پۆستی خیلافەتی وەرگرت وازی لە کاروباری دادوەری هێناو، چەند دادوەرێکی لە (دیمەشق)ی پایتەختی دەوڵەتەکەی دامەزراندن‌و کاروباری (دادوەری) خستنە بەردەست‌و بۆ یەکلاییکردنەوەی کێشەو سکالاکان دەسەلاتی تەواوی پێدان، کاربەڕێوەبەری هەرێمەکانیشی هەمان پەیڕەوی ئەویان گرتەبەر، بەڵکو فەرمانی داو والیەکانی لە کاروباری دادوەری دوورخستنەوە، ئیتر بە درێژایی سەردەمی (ئومەوی) خەلیفەکان چ لە پایتەختی دەوڵەتەکەیاندا، چ لە تەواوی شارو هەرێمەکاندا بەسەر هەمان هێڵ‌و نەخشەدا ڕۆیشتن‌و تەنها لە سێ ڕووەوە نەبێ پەیوەندیان بە (دادوەری ئیسلامی)یەوە پچڕا، سێ ڕووەکان ئەمانەن:

١ــ دامەزراندنی دادوەران بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە (دیمەشق)ی پایتەخت.

٢ــ سەرپەرشتیکردنی کرداری (دادوەران)و بەدواداچوونی کاروبارە تایبەتیەکانیان لە: دامەزراندن‌و لێخستن‌و موچەو ڕزق‌و ڕۆزیان‌و ڕەوشت‌و ئاکاریان‌و چاوەدێری خستنە سەر هەموو ئەو حوکمە دادوەریانەی لە لایەن ئەوانەوە دەردەچن‌و دڵنیا بن لەوەی کە تا چ ئاستێك لەگەڵ هەق‌و دادپەروەری‌و شەرع‌و دین‌و پابەندبوون بە ڕەوشتی دادوەریەوە دێنەوە.

٣ــ بەڕێوەبردنی دادوەری (مظالم)و (حسبة): ئەمەو خەلیفە (ئومەوی)یەکان بە شێوەیەکی تایبەت سەرپەرشتی تەواوی دادوەری (مظالم)یان دەکرد تا کار بەوە گەیشت بوو بە دەزگایەکی سەربەخۆو لەسەر پایەکانی خۆی ڕاوەستا، لێرەدا دەبینین کە

---

١ المصدر نفسه (ص: ١٦٦).

(دادوەری) لە سەردەمی (ئومەوی)دا لە هەموو دەسەڵاتێك تا بە دەسەڵاتی (خەلیفە) یان (والی)یش ڕادەگات جودا بووە، ئەمە لە کاتێکدا (خەلیفە) یان (والی) توانای دامەزراندن‌و لێخستنی (دادوەر)ەکانیشیان هەبووە، ئەوان خۆیان لە کاروباری (دادوەری)و ئیجتیهادو حوکمەکانی هەڵنەدەقورتاند، بەڵکو تەنها ئەوەیان لەسەر بوو ئەو حوکمانە جێبەجێ بکەن کە (دادوەران) دەریان دەکردن،[1] (النُّباهي) دەڵێت: کاتێك جڵەوی دەسەڵات کەوتە دەست (معاویەی کوڕی صخر) هەوڵیدا لەسەر ڕێ‌و شوێنی پێشینەکانی خۆی بڕوات‌و وەکو ئەوان چاودێری (دادوەران) بکات، ئیدی ماوەی زەمانێك ئەم ڕەسم‌و دابە بەم شێوەیە بەڕێوەچوو.[2] معاویە (خودا لێی ڕازی بێت) یەکەمین (خەلیفە) بوو بە تەواوەتی وازی لە پۆستی (دادوەری) هێناو دای بە خەڵکانی تر، ئەو وێڕای شارو هەرێمەکانی لە بنکەو بارەگای حوکومەتەکەشیدا (دادوەر)ی دامەزراندبوون.[3]

## سێیەم: مووچەی (دادوەران):

وەك زانراوە (عومەری کوڕی خەتاب) دەسەڵاتی (دادوەری) لە دەسەڵاتی (ویلایەت) جیاکردەوەو، یەکەم کەسیش بوو موچەو ڕۆزی بۆ (دادوەران) بڕیەوە، (عەلی)ی ئەمیری ئیماندارانیش (کە بە دنیانەویستی‌و قەناعەت ناسرابوو) سەبارەت بە کاروباری دادوەران، بە کاربەڕێوەبەری (مصر)ی دەڵێت: دەستی خۆتی بۆ واڵا بکەو هێندەی موچەو ڕۆزی پێ بدە گرفتەکانی پێ لە بەین بەرێ‌و پێداویستیەکانی پێ جێبەجێ بکات، بەم جۆرە پێویستی بە خەڵك نابێت.[4] ئەم بارودۆخە لە سەردەمی (ئومەوی)یەکاندا بەردەوام بوو، لە (بیت المال)ەوە موچەو ڕۆزی بە دادوەران دەدراو،[5] لەگەڵ ئەوە زۆریان دەدرایە، بەڵام بە گوێرەی بارودۆخەکان‌و وڵاتەکان ئەندازەکەی جیاوازی تێدەکەوت.[6]

(الشعبي) لە (شریح)ەوە دەگێڕێتەوە کە ئەو مانگانە بڕی پێنج سەد درهەم مووچەی لەسەر دادوەری وەرگرتووەو دەیوت: مانگەکەم بۆ تەوا دەکردن‌و کارەکانم بە تەواوەتی بۆ ئەنجام دەدان، هەروەها دەیوت: لە ژووری دادوەریدا خۆمیان بۆ بەند بکەم‌و موچەو

---

١ المصدر نفسه (ص: ١٦٧).
٢ تأريخ قضاء الأندلس (ص: ٢٤).
٣ عبقرية الاسلام في أصول الحكم (ص: ٣٤٢).
٤ القضاء ونظامه في الكتاب والسنة المطهرة (ص: ٢٦٧).
٥ تأريخ القضاء في الاسلام (ص: ١٦٧).
٦ المصدر نفسه (ص: ١٧٧).

ڕۆزیشیان لێ وەرنەگرم؟!، لە ساڵی (٧٢)ی کۆچیدا (عبدالملك ی کوڕی مەڕوان) هات بۆ (النخیلة)–ی عێراق–، لە هەواڵی (شریح)ی پرسیار کرد، ئیدی زانی کە لە سەردەمی (عبدالله کوڕی زوبێر)داوازی لە دادوەری هێناوە، وەلامی بۆ نارد بێتە لای، کە هات پێی وت: خودا سەرت بخات بۆ سەر پۆستی (دادوەری)یەکەت بگەڕێوە، فەرمانم داوە دە هەزار درهەم‌و سێ سەد تەغارت قوت پێ بدرێت، ئیتر قبوڵی کردو تا ساڵی (٧٨)ی کۆچی لەسەر دادوەری بەردەوام بوو،[1] ژمارەیەك (دادوەر)یش هەبوون لە بەرانبەر پیشەکەیاندا مووچەیان وەرنەدەگرت، بەڵکو کرێی خۆیان لە پێناوی بەرپاکردنی (شەرع)دا لەسەر خودای باڵادەست حیساب دەکرد، (مسروق ی کوڕی أجدع)ی قازی‌و موفتی (کە لە ساڵی ٦٣ی کۆچیدا مردووە) یەکێك بوە لەو دادوەرە خۆبەخشانە، ئەو لە بواری (فتوا)دا لە (شریح) زاناتر بوو، بەلام لە بواری (دادوەری)دا (شریح) لە ئەو بەرچاوڕوونتر بوو، هاوسەری (مسروق) وتوویەتی: (مسروق) لەسەر (دادوەری) موچەو ڕۆزی وەرنەدەگرت، (القاسم) وتوویەتی: (مسروق) دەیوت: ئەگەر ڕۆژێك دادوەری بکەم‌و هەقی تێدا بڵێم زۆرم لەوە بە لاوە خۆشترە ماوەی یەك ساڵ لە ڕێی خودادا سەنگەرنشینی بکەم.[2]

## چوارەم: تۆمارکردنی حوکمەکان‌و شایەدی گرتن لەسەریان:

تۆمارکردنی حوکمە قەزاییەکان کە لە لایەن دادوەرەوە دەردەچوون بۆ یەکەمین جار لە سەردەمی حوکمی (ئومەوی)دا سەری هەڵداو، (دادوەر) لە کاتی پێویستدا چاوی بە تۆمارەکەدا دەخشاندەوە، بۆ یەکەمجار (سُلَیم کوڕی عنزی التجیبي)ی دادوەری (مصر) لە سەردەمی (معاویە)دا دەستی بە تۆمارکردنی حوکم‌و بڕیارەکانی دادگا کرد، ئەمە لە ئەوەوە سەری هەڵدا کە چەند کەسێك بۆ بڕینەوەی کێشەی میراتی نێوانیان هاتنە لای، ئەویش دادوەری بۆ کردن‌و ماوەیەك ون بوون، ئیدی ناکۆکیان لەنێواندا دروست بوو لاموجیمیان دەکرد کە هیچ حوکمێکیان لە دیوانی (دادوەری)یەوە بۆ دەرچووبێت‌و جارێکی تر گەڕانەوەو داوایان کرد حوکمیان لە نێواندا بکەنەوە، دادوەر بەسەرهاتەکەی ئەوانی بیرکەوتەوەو پەردەی لەسەر ڕاستیەکان هەڵدایەوەو ئەوانیش دانیان پێداهێنا، ئەمجارەش دادوەری بۆ ئەنجامدانەوەو، داوای لە کاتیبەکەی کرد حوکمە قەزاییەکان لە تۆماری دادگادا بنووسێتەوە، لەسەر کاغەزێکیش حوکمی دادوەریان لەسەر کێشەکەیان بۆ بنووسێت‌و

---

[1] أخبار القضاة (٢/٢٢٧، ٣٩٧).

[2] طبقات إبن سعد (٦/٨٢)، تأریخ القضاء في الاسلام (ص: ١٧٨).

شاهێدیشیان لەسەر بگرێت.[١] (الكندي) دەڵێت: (سلیم) یەکەمین دادوەر بوو لە (مصر) تۆمارێکی بۆ حوکمە قەزاییەکانی خۆی دانا،[٢] (وەکو پێمان گەیشتووە) هەر ئەو یەکەمین کەس بوو لە پێناوی ئەوەدا ئەو حوکمە قەزاییانەی دەریان دەکاتو ئەمجا تۆماریان دەکات زیاتر جێگەی متمانە بنو کەس نەتوانێت لاموجیمیان لە بەرانبەردا بکات، هات شاهێدی بەسەرەوە دەگرتن، ئەمجا لە سەردەمی (عەباسی)دا ئەمە زیاتر بەرفراوان کرا.[٣]

## پێنجەم: یاریدەدەرانی دادوەر:

بە خاتری چاکبەڕێوەچوونی کاروباری دادوەری، عادەتەن (دادوەر) پێویستی بە چەند یاریدەدەرێك هەیە، یەکێك لەو یاریدەدەرانە (کاتیب)ە، جا ئیدی یەکێك لەم ناوانەی پێ دەگوترا: (کاتیبی دادوەر) یان (کاتیبی دادگا) یان (کاتیبی زەبت) یان (کاتیب عەدل)، یەکەمجار لە سەردەمی (ڕاشیدی)دا (دادوەر) یاریدەدەری بۆ دانرا.[٤] ئەمجا دوای ئەمە پەرەی پێدراو لە سەردەمی (ئومەوی)دا بە گوێرەی پێویستیو پێشکەوتنی ژیانو گوزەرانو فراوانبوونی بازنەی کارەکانی دادوەرو زۆربوونی سکاڵا (یاریدەدەر)ی تازەو زۆر بۆ (دادوەر) دادەنران، گرنگترینی ئەو یاریدەدەرانە ئەمانە بوون:

١ـ بانگڕایەڵ (المنادي): ئەو یاریدەدەرە بوو لە کۆڕی (دادوەر)دا دادەنیشتو کاری سەرەکی ئەو: ناساندنی (دادوەر)و جێگەو پێگەکەیو بانگکردنی کەسە ناکۆکەکانو لێکجیاکردنەوەی شکاتکەرو شکاتلێکراو بوو، ئەو کە پێی دەگوترا: (کەسی پشت سەری دادوەر) یان: (خاوەن کۆڕو مەجلیس)، ئەم جۆرە یاریدەدەرە بۆ یەکەمجار لە سەردەمی (قازی شورەیح)دا پەیدا بوو، (وکیع) لە (عمروی کوڕی قەیسی الماضي) یەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: پیاوێکم دەبینی لە پشت سەری (شورەیح)ەوە ڕادەوەستا، هەر کات دوو کەسی ناکۆك دەهات، دەیگوت: کامەتان شکایەتکەرە با قسە بکات، هەر (وکیع) دەگێڕێتەوە: ئەگەر (شریح) بۆ (دادوەری) دادەنیشت، هەتا بانگڕاهێڵ( المنادی) بانگی ڕانەهێشتبایە: ئایا ناکۆکێك یان سکاڵاکەرێك هەیە، کەسێك نیە داوای ئیسپاتکردن بکات؟ کەسێك نەماوە فتوا وەرگرێت؟ هەتا کەسێك بمابایە هەڵنەدەستاو نەدەڕۆی.[٥]

---

١ تأريخ القضاء في الاسلام (ص: ١٨٠).

٢ المصدر نفسه (ص: ١٨٠).

٣ المصدر نفسه (ص: ١٨٠).

٤ نظام الحكم في الشريعة الاسلامية (ص: ٢٥٩)، تأريخ القضاء (ص: ١٨٠).

٥ تأريخ القضاء، عرنوس (ص: ١٢٨)، تأريخ القضاء (ص: ١٨١).

٢ـ دەرگاوان (الحاجب): ئەو کەسە بوو لەبەر دەرگای (دادوەر) ڕادەوەستا، لە کاتێکدا (دادوەر) چاوی بە سکالاّکاندا دەخشاندەوە، نەیدەهێشت خەڵك بچێتە ژوورەوەو، کاتێك خەڵکانی ناکۆك لەبەر دەرگای دادوەر زۆر دەبوون سەرەی بۆ دادەنان، جار هەبوو (دەرگاوان) خودی (بانگڕاهێڵ) بووو هەردووك کارەکەی وێکڕا ئەنجام دەدان، یان خودی (پۆلیس) بوو و سەر بە دیوانی (شورتە) بوو، یان یەکێك بوو لە (شورتەکانی دادوەری)و، (دادوەر) ڕاپەڕاندنی هەندێك کاروباری نێو (دادگا) یان دەرەوەی (دادگا)ی پێ دەسپارد،[1] (وەکیع) دەڵێت: (إبراهیم النخعي) شورتەی قازی (شورەیح) بوو،[2] لە پشت سەری قازی (شورەیح)ەوە شورتەیەکی قامچی بەدەست هەبوو.[3]

٣ـ وەرگێڕ (الترجمان): چونکە گەل‌و نەتەوەیەکی زۆر هاتبوونە نێو ئیسلامەوەو بە هۆی ئیسلامەوە تێکەڵ بە یەکتر ببوون‌و یەکتریان دەناسی‌و ئەم ئایەتە پیرۆزەیان خستبووە بواری کارەوە: ﴿وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْ﴾[4] واتە: گێڕاومانن بە گەل‌و هۆز تا یەکتر بناسن، بە خاتری ئەمە دادوەر تەرجومانی بۆ خۆی دادەنا، جا هەر کاتێك ناکۆکی یان کێشە یان سکالاّیەکی ئەو گەلە ناعەرەبانەی هاتبایە بەردەم، بۆ وەرگرتنی وتەی کەسە ناکۆکەکان پشتی بە وەرگێڕێکی متمانەپێکراوی پەسند دەبەست.[5]

## شەشەم: چاودێری‌و بەدواداچوون:

ئەگەرچی خەلیفەکان‌و والیەکان بە خودی خۆیان وازیان لە پۆستی (دادوەری) هێنابووو کاری ئەوان لەم بوارەدا لە (دامەزراندن‌و لێخستن)ی ئەو دادوەرانەدا کورت هەڵاتبوو، بەڵام هیچ ڕێگریش لەبەر دەمیاندا نەبوون تا چاودێری کاری دادوەران بکەن‌و چاو بە حوکمەکانیاندا بخشێننەوەو بەدواداچوون لەسەر ئەو سکالاّو کێشەو بڕیارانە بکەن کە لە لایەن ئەوانەوە دەردەچوون، چونکە (خەلیفە) بەرپرسیاری یەکەمە لە بەرانبەر (دادوەری)و هەموو ئەو شتانەی پەیوەندیدارن بە سیاسەتی دین‌و دنیای تاکو کۆی ئوممەتەوە، ئیتر سپاردنی پۆستی (دادوەری) بە (دادوەران) (خەلیفە) لە بازنەی بەرپرسیارێتی دنیاو دواڕۆژ

---

١ تأريخ القضاء في الاسلام (ص: ١٨١).
٢ المصدر نفسه (ص: ١٨١)، أخبار القضاة (٢/٢١٥).
٣ تأريخ القضاء في الاسلام (ص: ١٨١).
٤ الحجرات (١٣).
٥ تأريخ القضاء في الاسلام (ص: ٤٢٣).

ناباتــە دەرەوە، لەبــەر ئەمــە خەليفــەكان بــەردەوام چــاودێری كاروبــاری (دادەوەران)يــان دەكــردو، بەدواداچــوونيان لەســەر ئــەو حوكمانــە دەكــرد كــە دەيــان دەكــردن، ئەگــەر كەموكورتيەك يان لادانێكيان تێدا بەدی كردبانایە ڕاستو ڕێكيان دەكردنەوە،[1] ئەم وتەيەی (النباهی) دووبارە دەكەينەوە كە پێشدا سەبارەت بە ئــەم بابەتــە هێنامــانو دەڵێــت: كاتێك كاروباری خيلافەت كەوتە بەردەست (معاويــەی كــوڕی صــخر)، وەكــو خەليفــە پێشــينەكانی هەوڵو تەقالاكانی خۆی بە خاتری چاودێريكردنی دادوەران خستنەگەر،ئەم كلتورە زەمانێك لەم ئاستەدا مايەوە.[2]

## حەوتەم: سەرچاوەی حوكمە قەزاييەكانی سەردەمی (ئومەوی):

دادوەران–ی ســەردەمی ئومــەوی– پــشتيان بــە هــەمان ئــەو سەرچــاوانە دەبەســت كــە دادوەرانی سەردەمی (ڕاشــيدی) پــشتيان پــێ دەبەســتن، پابەنــدبوون بــە: قورئــانی پــيرۆزو سوننەتو ئيجماعو ئيجتيهــادو ڕاوێــژو ئــەو حوكمــە قەزاييانــەی پــێش ئــەوان دەرچــووبوون، بێگومان پابەندبوون بە (قورئانو سوننەت) بنەمای ســەرەكی بــووو خــودی (خيلافــەت)يش پێيەوە پابەند بووو بەيعەتی لەسەر وەردەگيرا، (حوكمە پێشينە قەزاييەكان)يش كە خۆيــان لە وتەی هاوەڵان (خودا لێيان ڕازی بێت)داو ئەو حوكمانەدا بەرجەستە دەكرد كــە لــە لايــەن ئەوانەوە دەردەچوونو بە نيسبەت ئەوانــەوە جێگــەی بايەخپێــدان بــوونو پێيانــەوە پابەنــد بوون ، ئەمەش بە حوكمی ئــەوە هــاوەڵان لــە ســەردەمی پێغەمبــەرێتیو قوتابخانەكەيــەوەو دابەزينی (وەحی)يەوە لەوان نزيكترن، بە تايبەتيش هەموو ئــەو حوكمــە قەزاييانــەی كــە لــە لايــەن خەليفــە ڕاشــيدەكانەوە دەردەچــوون، هــەروەها لــەو ســەردەمەدا بــە حــوكمی بــەرفراوانبوونی دەوڵــەتی ئيــسلامیو جيــاوازی زۆری دابونەريتــە كۆمەڵايەتيــەكانی پانتــايی جيهانی ئيسلامی، (عورف) كاريگــەری لەســەر كێشەكانو چۆنيەتی يەكلاييكردنــەوەی ئــەو كێشانەو حوكمە قەزاييەكان دادەنا، دادوەران بە گوێرەی ئەو عورفــو دابونەريتانەی لە نێــو كۆمەڵگاو ميللەتە جۆراوجۆرەكاندا باوبوونو مەبەستی وشەو زاراوەكانيان پێناســە دەكــردو لە سكاڵاو سوێندو تۆمەتەكانيان دەنۆڕیو حوكميان لەسەر دەدان.[3]

---

١ المصدر نفسه (ص: ١٨٦).

٢ المصدر نفسه (ص: ١٨٦).

٣ المدخل الفقهي (١/١٥٠).

(شەرعزان‌و دادوەرو خەلیفە)كان جەختیان لەسەر سابتبوونی گواستنەوەی دەقەكان‌و ڕاست‌و دروستبوونی فەرموودەكان دەكردەوە ئەمجا پشتیان پێ دەبەستن، معاویە (خودا لێی ڕازی بێت) لە بەرانبەر پشتبەستن بە فەرموودە هەڵبەستراوەكان هۆشداری دەداو زەنگی بقەی بەگوێی هەموو لایەك دادەدا، وتاری بۆ وەفدێكی (قوڕەیش) داو پاش دەربڕینی سوپاس‌و ستایشی شایستە بۆ خودا، وتی: بەڵام دوای ئەمە: سەبارەت بە ئێوە هەواڵم پێگەیشتووە: كە كەسانێك لەنێو ئێوەدا پەیدابوون، بە شێوازێك قسە دەكەن‌و وتار دەدەن نە لە كتێبی خودادا (كە قورئانە) بوونیان هەیەو، نە لە پێغەمبەری خودا (ﷺ)ەوە بەجێ ماون، جا ئەو كەسانە هەرە نەفامەكانتانن.[1] ئەمەو دادوەران لە لایەن (خەلیفەو والی)یەكانەوە دادەمەزرێنران‌و لە دەركردنی حوكمەكانیاندا دەگەڕانەوە بۆ دەقەكان-ی قورئان‌و سوننەت-و، تا ڕادەیەكیش بۆ حوكمە قەزاییەكانی پێش خۆیان‌و وتەو بڕیاری هاوەڵان، ئەگەر لەم سەرچاوانەدا هیچیان دەست نەكەوتبایە ئەوا ئازادبوون بە ڕاو ئیجتیهادی خۆیان حوكم بدەن‌و كێشەكان چارەسەر بكەن، لەو سەردەمەدا مەزەبە فیقهیەكان سەریان هەڵنەدابوو، حوكمەكان نەنووسرابوونەوەو تێپەڕاندنی كارەكە دەگەڕایەوە بۆ خودی (دادوەرەكان) خۆیان‌و، لەگەڵ ڕاوێژكردن بە زانایان‌و شەرعناسان‌و موجتەهیدانی ئەو شارو وڵاتانەی تێیدا دەژیان حوكمەكانیان دەردەكردن.[2]

## هەشتەم: تایبەتمەندكردنی دادوەران‌و تایبەتكردنی دادوەری:

بە هۆی فراوانبوونی دەوڵەتی ئیسلامی لە سەردەمی (ئومەوی)داو زۆربوونی خەڵك‌و سەرقاڵبوونی خەلیفەكان بە فتوحات‌و بەڕێوەبردنی دەوڵەت‌و دامركاندنەوەی ئاژاوەكانی ناوخۆوە، خەلیفەكان دەستیان لە كاروباری (دادوەری) كێشایەوەو، هەموو تایبەتمەندیەكانی ئەم پۆستەیان خستە بەردەست (دادوەران)ەوەو، ئەركی چاوخشاندن بە تاوان‌و سزاكانیان بە ئەوان سپارد، (معاویەی كوڕی ئەبی سوفیان) یەكەم (خەلیفە) بوو كاروباری دادگاییكردنی بابەتەكانی (برینداربوون‌و كوشتن‌و تۆڵەسەندنەوە)ی بە دادوەران سپارد، نامەیەكی بۆ قازی (سُلیم كوڕی عتر)ی دادوەری (مصر)ی نووسی‌و فەرمانی پێكرد: بە خودی خۆی لە تاوانەكانی (برینداركردن‌و شكاندن) بنۆڕێت‌و پاشان مەسەلەكە بۆ (خاوەنی دیوان) بەرز بكاتەوە، ئەمەو قازی (سولەیم) یەكەم دادوەر بوو لە (بریندار)ی

---

١ أعلام الموقعين (٦٣/١).

٢ تأريخ القضاء في الاسلام (ص: ١٩٠).

ڕوانیو حوکمی لەسەر دا، ئەگەر یەکێك بریندار دەکرا یان ئەندامێکی دەشکێنرا، دەهاتە لای دادوەر، شاهیدەکانی دەهێنانو دەیسەلماند کە فلان کەس برینداری کردووە، یان ئەو ئەندامەی شکاندووە، دادوەر ڕاپۆرتێکی لەسەر ئەمە دەنووسیو کەسوکاری نزیك (خوێنگرو خوێنستێن)ی بابای برینداری لێ ئاگادار دەکردەوەو ئەمجا بۆ (خاوەن دیوان)ی بەرزدەکردەوە، هەر جارێك لە کاتی موچە داندا خوێنی پێویست بۆ کەسی بریندارکراو یان ئەندامشکێنراو بە ڕێژەی دەیی لە موچەی تاوانبار دەگێڕدرایەوەو بە شێوەی قیست لە ماوەی سێ ساڵدا بۆی تەواو دەکرا، ئەمەو ئەم کارە بەم شێوازە درێژەی کێشا.[1]

(دادوەر) لە سەردەمی (ئومەوی)دا بە شێوەیەکی گشتی لە بابەتەکانی: سەروەتو سامانو مافەکانو حوکمو برینداریەکانی سەبارەت بە (خێزانو میراتو تۆڵەو سزا)ی دەنۆڕی، ئەمەی گوتمان لە کتێبی (أخبار القضاة)ی (وکیع)و کتێبی (الولاة والقضاة)ی (الکندي)داو لە میانەی هێنانی بابەتی ژیاننامەی دادوەرەکاندا خراوەتەڕوو.[2] هەر لە سەردەمی (ئومەوی)دا هەندێك کاری شێوە قەزاییو هەندێکی تری ئیداری خرابوونە سەر کاروبارەکانی دادوەر، چاودێریکردنی سامانی هەتیوانو سەرپەرشتیکردنی موڵكو ماڵە وەقفیەکانو فتوادان، لە ڕستەی ئەم کارە زیادانە بوون.[3]

## نۆیەم: دادوەرانو کاروبارە جۆراوجۆرەکان:

بە حوکمی ئەوە دادوەران جێی متمانەبوونو، بە سیفەتەکانی دادپەروەریو دەستپاکیو خۆپاریزیو خواپارێزی ناویان دەرچووبوو، خەلیفەکان لە سەردەمی ئومەویدا سەرپەرشتیکردنی چەند دەزگایەکیان دەخستنە سەرشان:

١ـ شورتە: وێڕای ڕاییکردنی کاروبارە قەزاییەکانی خۆیان، دادوەران سەرۆکایەتیکردنی دەزگای شورتەشیان خرایە ئەستۆ، بەمە لە چەند شارێکی جیهانی ئیسلامدا سەرۆکایەتیکردنی هەردوو پۆستی دادوەریو پۆلیس لە لایەن (دادوەر)ەوە بەڕێوەدەچوون، (وکیع) دەگێڕێتەوە: کە لە مانگی (ربیع)ی ساڵی (٥٣)ی کۆچی، دەشگوترێت (٥٤)ی کۆچیدا (معاویه) (سعیدی کوڕی عاص)ی لە پۆستی ویلایەتی شاری (مەدینە) لێخست، (مەڕوان) (سعید)ی هێنایەوە جێی خۆیو (أبا سلمة کوڕی عبدالرحمن ی کوڕی عوف)ی لە

[1] نظام الحكم في الشريعة الاسلامية (ص: ٢٦٥)، تأريخ القضاء في الاسلام (ص: ١٩٢).
[2] تأريخ القضاء في الاسلام (ص: ١٩٣).
[3] المصدر نفسه (ص: ١٩٣، ١٩٤، ١٩٥).

پۆستی (دادوەری) دابەزاند،، (مصعب ی کوڕی عبدالرحمن ی کوڕی عوف)ی برای کردە دادوەر، لەگەڵ ئەم پۆستەیدا پۆستی سەرۆکایەتیکردنی دەزگای (پۆلیس)یشی پێ سپارد، ئەویش بە توندوتیژی خەڵکی دەگرت،[1] (الكندي) لە (مسلمةی کوڕی حەکەم)ەوە دەگێڕێتەوە (مەڕوان) (أباسلمة)ی لێخست، (مصعب ی کوڕی عبدالرحمن ی کوڕی عوف)ی کردە دادوەر، لەم بەڕێوەبەرایەتیکردنەیدا توندوتیژ بوو، کاتێك سەرۆکایەتی (شورتە)شی خرایە ئەستۆ توندتر خەڵکی دەگرت.[2]

(الكندي) لە (مسلمةی کوڕی مخلّد)ەوە دەگێڕێتەوە کە (مسلمة) بەرەو (فسطاط) هات، (سائبی کوڕی هشامی کوڕی کنانەی عامری) لە سەرۆکایەتی شورتە لێخستو، (عابسی کوڕی سعید)ی لە جێگە داناو، (سلیمان کوڕی عنز)ی لە پۆستی دادوەری لاداو ئەمەشی حەواڵەی (عابس) کرد، بەمە عابس بوو بە یەکەمین کەس کە لە ساڵی (٦٠)ی کۆچیدا، هەردوو کاروباری دادوەری‌و شورتەی بۆ جەم بوون.[3] کاتێك لە ساڵی ٦٢ی کۆچیدا (مسلمە) پاش تێپەڕینی ١٥ ساڵ بەسەر ویلایەتەکەیدا ڕۆیشت‌و لە ڕەمەزانی ئەو ساڵەدا (سعیدی کوڕی یزید ئەزدی) بوو بە والی (مصر)، ئەویش (عابس)ی لەسەر هەردووك پۆستی (دادوەری‌و شورتە) هێشتەوە، کاتێکیش (عبدالرحمن کوڕی عتبەی کوڕی جحدمی فهری) بوو بە والی ئەو وڵاتە بە هەمان شێوە ئەویش (عابس)ی لەسەر هەردوو پۆستەکەی جێگیر کردەوە، (الكندي) دەڵێت( مسلمةی کوڕی مخلد)ی والی (مصر) (عابسی کوڕی سعید)ی بە سەرۆکشورتە دامەزراندو ئەمجا وێڕای ئەم سەرۆکایەتیە سەرۆکایەتیکردنی (دادوەری)یشی پێ سپارد،[4] ئەمە لە سەرەتای ساڵی (٦١ی کۆچیدا) بوو.[5]

٢ـ ئیمارەت= ئیدارەکردنی ویلایەت:

جاروبار هەندێك دادوەر کاروباری ویلایەتیان بە دەستەوە دەگرت، جاریش هەبوو (خەلیفە) ئەگەر لە (دمشق) دەرچووبایە (دادوەر)ی لە جێی خۆی دادەنا، زۆرینەی والیەکان ئەگەر بە مەبەستی ئەنجامدانی کارێکی گرنگ لە شارەکانیان دەرچووبانایە سەرپەرشتیکردنی کاروبارەکان‌و بەڕێوەبردنی شارەکانیان دەخستەبەردەستی (دادوەر).

---

١ أخبار القضاة (١/١١٨).

٢ أخبار القضاة (١/١١٨).

٣ تأريخ القضاء، عرنوس (ص: ٢٦)، الولاء والقضاء (ص: ٣١١، ٣١٣).

٤ تأريخ القضاء في الاسلام (ص: ١٩٦).

٥ المصدر نفسه (ص: ١٩٦).

(أبو زرعة) دەڵێت: کاتێك معاویه بەرەو (صفين) دەرچوو قازی (فضالەی کوڕی عُبيد)ی لە (دمشق) بە وەکالەت بەجێ هێشت.[1]

## دەیەم: ناوی ( دادوەران )ی سەردەمی ( معاویە ):

١ـ دادوەرە بەناوبانگەکانی (دیمەشق):

أـ (فضالەی کوڕی عُبيد): لەسەر پەسندکرانی لە لایەن (أبو الدرداء) (خودا لێی ڕازی بێت)، (معاويه پۆستی دادوەری (شام)ی پێدا، هەتا لە ساڵی (٥٣)ی کۆچی‌و لە سەردەمی معاویەدا مرد لەسەر پۆستەکەی بەردەوام بووو، معاویە لە ڕێوڕەسمی کفن‌و دفنی تەرمەکەیدا ئامادە بوو، هەر جارێك لە دیمەشق چووبایە دەرەوە (فضالة)ی لە جێی خۆی دادەنا،[2] (فضالة) سزای (حد)ی ڕەتکردۆتەوە، کاتێك یەکێك بابای ماڵدزی لەگەڵ خۆی بە ماڵەکەیەوە بۆ لا هێنابایە، (فضالة) ڕەبەری دەکەوت: لەوانەیە دۆزیبێتتەوە، لەوانەیە هەڵتگرتبێتەوە، خاوەن ماڵ دەیگوت: إنا لله وإنا إليه راجعون، خۆ بە خودا قازی ڕەبەری دەکەوێت‌و قسەی فێردەکات! ، کابرای دز دەیگوت: ئەرێ بە خوا، خودا چاکەت لەگەڵ بکات، دۆزیومەتەوە، جا ئازادی دەکرد، ئیتر چۆن پێغەمبەری خودا (ﷺ) (ماعز)ی تەلقین دەکردو ڕەبەری دەکەوت، بەم حیسابە شەرعزانان ڕێیان داوە بابای تۆمەتبار کە بە حوکمی سزا (حد) مەحکوم دەبێ تەلقین بدرێ‌و قسەی فێر بکرێت تا بەم پێیە خۆی دەرباز بکات.[3]

ب ـ نعمانی کوڕی بشیری کوڕی سعدی (أبو إدريسی أنصاری خزرمی)ی هاوەڵ: لە دوای (فضالة)ەوە پۆستی (دادوەری) (شام)ی وەرگرت، لە ساڵی (٦٤)ی کۆچیداو لە نزیك (حمص) کوژرا.[4]

٢ـ دادوەرانی (مەدینە):

أـ أبو هريرة:ی هاوەڵی بەناوبانگ (خودا لێی ڕازی بێت):

((وکیع) لە (نعیم)ەوە دەگێڕێتەوە: (أبو هريرة)م —لە شاری مەدینەدا— دەبینی دادوەری دەکرد. فەرمانی دەدا یەکسانی لە نێوان ڕکەبەرەکاندا ئەنجام بدرێت، بەندکردنی قەرزداری تەنگدەستی ڕەت دەکردەوە، حوکمی (٨٠) هەشتا داری بەسەر بوختانکەردا دەسەپاند،

١ قضاء دمشق لإبن طوال (ص: ٤١٣).

٢ أخبار القضاة (٣/١٩٩، ٢٠١)، تأريخ القضاء في الاسلام (ص: ١٩٨).

٣ تأريخ القضاء في الاسلام (ص: ١٩٩).

٤ المصدر نفسه (ص: ١٩٩).

ئەمەو (أبو هريرة) تا لە ساڵی (٥٩)ی کۆچیدا وەفاتی کرد لە (مەدینە)دا نیشتەجێ بوو،[١] پێ دەچێت بەر لە (عبدالله ی کوڕی حارث) دادوەری (مەدینە) بوویێت.

ب ـ عبدالله ی کوڕی حارثی کوڕی نوفل (أبو عبدالله ی کوڕی نوفل ی کوڕی حارث): هاوکات لەگەڵ ویلایەتی (مەروانی کوڕی حەکەم) بەسەر (مەدینە)دا یەکەمین دادوەری ئەو شارە پیرۆزە بوو لە خیلافەتی (معاویە)دا، یەکەمین (دادوەر)یش بوو حوکمی هەقی بە دژی (ئالی مروان) دەرکرد، بەمە هێندەی تر لە لای (مروان) خۆشەویستو پڕ خێروبێرتر بوو، ئەو بە سوێندو شاهێدێك حوکمی دەکرد، لە ساڵی (٨٤)ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردو،لە کەسە هەرە صالحو شەرعزانە موسڵمانەکانی ئەو سەردەمە بوو.[٢]

ج ـ (أبو مسلمةی کوڕی عبدالرحمن ی کوڕی عوف)ی کۆچکردووی (٩٤)ی کۆچی:

لە ڕیزی تابیعیە گەورەکان بوو، بە قسەی خۆی شارەزاترین کەسی ئەو سەردەمەیە لە شەرعدا، (سعیدی کوڕی عاص)ی والی (مەدینە) کاروباری (دادوەری) (مەدینە)ی پێ سپارد لە میانەی بڕینەوەی کێشەکاندا خاوەنهەقی بە تاکە شاهێدێکەوە سوێند دەدا.[٣]

س ـ (مصعب ی کوڕی عبدالرحمن ی کوڕی عوف)ی کۆچکردووی ٦٤ی کۆچی:

لە ساڵی ٥٣ یان ٥٤ی کۆچیدا (مروانی کوڕی حکم) کردی بە (دادوەر)ی شاری مەدینە، لەگەڵ (دادوەری)یدا سەرۆکایەتیکردنی (پۆلیس)یشی خستە ئەستۆ، لە میانەی تێپەڕاندنی حوکمەکانیدا توندوتیژ بوو، کاتێك بوو بە سەرۆکی دەزگای پۆلیس سەبارەت بە تاوانی ڕەشەکوژی کە لە (مەدینە)دا بڵاوببۆوە بە توندی بەنێو خەڵك وەردەبوو و دەیگرتن،[٤] کاتێك (معاویە) وەفاتی کردو(یەزید) بوو بە (خەلیفە)، (یەزید) (عوسمانی کوڕی محمدی کوڕی أبی سوفیان)ی کردە والی (مەدینە)، (عوسمان)یش (طلحةی کوڕی عبدالله ی کوڕی عوف)ی کردە (دادوەر)ی شار، لەبەر ئەوە دڵاوا بوو (طلحة الجواد) واتە (طلحة)ی سەخاوەتمەندی پێ دەوترا.[٥]

---

١ المصدر نفسه (ص: ٢٠٠)، أخبار القضاة (١/١١٠، ١١٤).

٢ تأريخ القضاء في الاسلام (ص: ٢٠١).

٣ أخبار القضاة (١/١١٦)، تأريخ القضاء في الاسلام (ص: ٢٠١).

٤ أخبار القضاة (١/١١٨)، تأريخ القضاء في الاسلام (ص: ٢٠١).

٥ تأريخ القضاء في الاسلام (ص: ٢٠١).

٣ـ دادوەرانی (بەصرە):

کەسانێکی زۆر کاروباری (دادوەری)ی (بەصرە)یان بەڕێوەبردووە، ناوی هەندێکیان دەهێنین: (عُمیرةی کوڕی یثربي الضبي): کە لە لایەن (عامری کوڕی کُرِیز)ی کاربەڕێوەبەری (معاویە) لە (بەصرە) کرا بە (دادوەر)، (عُمیرة) حوکمی بە بژاردنەوەی سپاردە–ی فەوتاو–دەدا، تا ساڵی ٤٥ك لەسەر ئەم پۆستەی بەردەوام بوو، (زیاد) کە بوو بە والی (بەصرە) (عمیرە)ی لێخستو (عمرانی کوڕی حصین)ی لەجێی دانا، بەلام لەسەر داوای خۆی لێی کشایەوە، ئەمجا پۆستی (دادوەری)ی بەصرە کەوتە بەردەست (عبدالله ی کوڕی فُضالة)، پاش ئەویش (عاصمی کوڕی فُضالة)ی برای، ئەمجا (زرارةی کوڕی أبي أوفا).[1]

٤ـ دادوەرانی (کوفە):

شاری (کوفە) پاش دامەزراندنی لە سەردەمی (عومەری کوڕی خەتتاب) (خودا لێی ڕازی بێت)داو کرانی بە پایتەختی دەوڵەتی ئیسلام لە لایەن (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) (خودا لێی ڕازی بێت)، لە ڕووی زانستو ڕۆشنبیریەوە ببووە چالاکترین مەڵبەندی بزوتنەوەی زانیاری.

قازی (شریح) بەناوبانگترین دادوەری شاری (کوفە) بوو، ئەو لە سەردەمی (عمر)ەوە دەستی لەم پۆستە گیرببوو و، بە درێژایی سەردەمی (ڕاشیدی)و ماوەیەکی دوورو درێژیش لە سەردەمی (ئومەوی) –کە ماوەی (٣٥) سی‌و پێنج ساڵ زیاتر بوو– بەردەوام بوو، لە سەردەمی خیلافەتی (عبدالله ی کوڕی زوبێر)دا وازی لێ هێنا، ئەمجا لەسەر داوای (عبدالملك) دەستی پێکردەوەو، لە کۆتاییداو لە ساڵی (٧٨)ی کۆچی داوای لە (حجاج) کرد ئیستیقالەی ئەم پۆستەی لێ قبوڵ بکات، ئەویش لێی قبوڵ کرد.[2] (مسروقی کوڕی أجدعی هەمەدانی) یەکێکی تر بوو لەو دادوەرە مێرخاسانەی لە (عێراق)ی سەردەمی (زیاد)دا لە لایەن (معاویە)وە کرا بە دادوەری شاری کوفە.[3]

٥ـ دادوەرانی (مصر):

لە دادوەرە بەناوبانگەکانی (مصر)ی سەردەمی معاویە: (سولەیم کوڕی عنز التحیبی) لە ساڵی (٤٠)ی کۆچیدا یەکەمین کەس بوو لەو وڵاتەدا کاروباری دادوەری بۆ معاویە ڕایی بکات.[4] (عابسی کوڕی سعدی مرادی): کە لە لایەن (مسلمەی کوڕی مخلد)ی والی مصرەوە

١ أخبار القضاة (٣/٢)، تأريخ القضاء في الاسلام (ص: ٢٠٧).
٢ أخبار القضاة (١٨٤/٢)، تأريخ القضاء في الاسلام (ص: ٢٠٧).
٣ تأريخ القضاء في الاسلام (ص: ٢٠٧).
٤ المصدر نفسه (ص: ٢٠٩).

پۆستی دەزگای (پۆلیس)ی پێدرابوو، پاش لێخستنی (سولەیمی کوڕی عتر) لە پۆستی (دادوەری)، ئەم پۆستەشی لەگەڵ سەرۆکایەتی کردنی (پۆلیس) بە (عابس) سپارد، بەمە هەردووك پۆستی (پۆلیس)و (دادوەری) بۆ (عابس) جەم بوون.[1]

ئەمانەی باسمان کرد بەناوبانگترین (دادوەر)ی سەردەمی (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) بوون.

## یازدەیەم: نیشانە جیاکانی (دادوەری) لە سەردەمی (معاویە)و (ئومەوی)دا:

**ئەمانەی دادێن گرنگترین نیشانە جیاکانی (دادوەری) سەردەمی (ئومەوی)ن:**

١ــ بە ڕەچاوکردنی ئەو گەشەسەندن‌و بەرفراوانبوونەی لە سەردەمی (خیلافەتی ئومەوی)دا هاتە پێشەوە، (سیستەمی دادوەری) لە سیما بنەڕەتیەکەی‌و ڕێکخستنە جەوهەریەکەی‌و ئامرازو ئامانجەکانیداو، لە ڕاپەڕاندنی هەق‌و دادپەروەریداو پاکیزەیی‌و بابەتی بونیدا درێژەپێدەری هەردووك سەردەمی پێش خۆی، واتە سەردەمی (پێغەمبەرێتی)و (ڕاشیدی) بووو وەکو خۆی مایەوە.

٢ــ لەگەڵ زیادبوونی سەلیقەو ئەزموون‌و فرتوفێڵ لە دژی تۆمەتبار، بە خاتری دەرکەوتنی هەق‌و ڕاستی‌و بە ئەنجامگەیاندنی دادپەروەری‌و پێکانی ئامانج‌و ئیسپاتکردنی شەرعیانە: دادوەرانی سەردەمی (ئومەوی)یش هەمان ئامڕازو هۆکارە باوەکانی سەردەمی (ڕاشیدی)یان بەکاردەهێنان.[2]

٣ـ وێڕای سەرچاوە ئەصڵیەکانی سەردەمی پێغەمبەرێتی کە بریتی بوون لە: (قورئانی پیرۆزو سوننەتی بەرێز)و، سەرچاوە ئیجتیهادیەکانی سەردەمی (ڕاشیدی): کە بریتی بوون لە: (إجماع‌و قیاس‌و ڕاو حوکمە دادوەریەکانی پێشین)، لە سەردەمی (ئومەوی)یدا چەند سەرچاوەیەکی تازە بۆ دەرکردنی حوکمەکانی دادوەری سەریان هەڵدا، کە خۆیان لە: (عورف‌و وتەی هاوەڵان‌و إجماعی دانیشتوانی مەدینە)دا نیشان دەدا.[3]

---

١ المصدر نفسه (ص: ٢٠٩).

٢ المصدر نفسه (ص: ٢١٣).

٣ المصدر نفسه (ص: ٢١٤).

٤ــ (دادوەران)ی شام لە لایەن خەلیفەکانەوە دادەنران، جاروباریش دادوەرانی هەرێمەکان هەر لە لایەن ئەوانەوە دیاری دەکران، (دامەزراندن‌و لێخستن)ی دادوەرانی شارەکانیش بە دەست والیەکان بوو.

٥ـ (خەلیفەو والی)یەکان جەختیان لەسەر ئەوە دەکرد کە لە نێو زانایان‌و شەرعناسان‌و مێرخاسانی ئوممەتدا ئەو کەسە هەرە باشانەیان بۆ سەرۆکایەتیکردنی پۆستی (دادوەری) لێ هەڵبژێرن کە زۆرترین سیفەتەکانی (قازی شەرعی)یان تێدایەو زیاتر لە خودا دەترسێن‌و چاکتر بە هەق‌و شەرعەوە پابەندن‌و دادپەروەری لە نێو خەڵکدا بەرپا دەکەن.

٦ــ دەرکەوتنی چەند گۆڕانکارییەکی دیارو زەق بە سیستەمی (دادوەری) سەردەمی (ئومەوی)یەوەو، بۆ یەکەمجار ئەم چەند شتە بە سیستەمی (دادوەری)یەوە زیادکران:

أــ تۆمارکردنی حوکمەکان‌و دانانیان لە تۆمارێکی تایبەتدا، بەمە ڕێ لەبەردەم لەبیرچوونەوەیان‌و نکوڵیلێکردنیانەوە گیرا.

ب ــ سەرپەرشتیکردنی موڵک‌و ماڵە وەقفیەکان، بە خاتری بەجێگەیاندنیان بە شێوەیەکی ڕێکوپێك.

ج ـ پاسکردنی موڵک‌و ماڵی هەتیوان‌و چاودێریکردنی سەروەسێتەکان.

دـ ڕیزکردنی سکالاکان‌و بەکارهێنانی سیستەمی تیروپشك (قورعە) بۆ بردنە ژوورەوەی کەسە ناکۆکەکان‌و بانگکردنی خەڵك بۆ لای دادوەر بە شێوەی ڕیزبەندی‌و سەرە.

هـ ـ هەبوونی چەندین جۆر یاریدەدەر بۆ (دادوەر)، وەکو دەرگاوان‌و پۆلیس.

وـ خواستنی کۆمەك لە پۆلیس بۆ جێبەجێکردنی حوکمەکانی دادوەری‌و کۆتایی هێنان دەمەقاڵەو مشتومڕی کەبەرەکان.

٧ـ دادوەرەکان موجتەهید بوون‌و بۆ دەرکردنی حوکمە دادوەرییەکان‌و هەڵێنجانیان لە قورئان‌و سوننەت‌و تەواوی سەرچاوەکانی تردا تەواو ئازاد بوون‌و، بەڕای خەلیفەکان‌و هیچ مەزهەبێکی فیقهیەوە پابەند نەبوون، ئەمە لەگەڵ ئەوەدا کە ئەم پەیڕەوەیان نەبۆتە ڕێگر لەبەردەمیاندا تا پرس‌و ڕاوێژ بە زانایان نەکەن‌و لە کۆڕە دادوەرییەکاندا داوەتیان نەکەن.[1]

---

١ تأريخ القضاء في الاسلام (ص: ٢١٣ـ٢١٥).

٨ـ دادوەران لە کارەکانیاندا سەربەخۆبوونو کاریگەری (خەلیفەو حوکمڕان)ەکانیان لەسەر نەبوو و، تۆزقاڵێکیش ڕەنگی لایەنە سیاسیو بزوتنەوە شۆڕشـچیەکانو ناکۆکیە فکریەکانو ئاژاوە ناوخۆییەکانیان پێوە دیار نەبووە.[١] ئەوانەی باسمان کرد گرنگترین نیشانەکانی دادوەری سەردەمی (ئومەوی) بوون.

## دوازدەیەم: لێدوانەکەی (عومەری کوڕی خەتاب) (خودا لێی ڕازی بێت) سەبارەت بە (دادوەری) بۆ (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت):

(عومەری کوڕی خەتاب) (خودا لێی ڕازی بێت) ئەمەی بۆ معاویە (خودا لێی ڕازی بێت) نوسی: من سەبارەت بە (دادوەری) نامەیەکم بۆ نوسیوی، نە دەرهەق بە تۆ نە دەرهەق بە خۆم کەمتەرخەمیم تێدا نەنواندووە،بەڵکو دڵسۆزیم ئەنجامداوە،.... ئەمجا (عمر) وتی:

١ـ بە پێنج خەسڵەتەوە پابەند بە: هەم دینەکەت ساغو سەلامەت دەبیٚ، هەم بەشی هەرە باشی خۆت دەستگیر دەبیٚ، ئەگەر دوو ناکۆك هاتنە لات، پێویستە شاهێدی دادپەروەرو، سوێندی بڕێنەرەوەیان لیٚ بخوازی، ئەمەیە ڕێوشوێنی دادوەر کە هیچ لە نادیار نازانێت، جا هەر کەس بە ئەمەوە پابەند بێت دینەکەی بۆ دەپارێزرێتو باشترین پشكو پاداشتی دواڕۆژیشی دەست دەکەوێت.[٢] واتای سوێندی بڕێنەرەوە: واتە بڕێنەرەوەو کوژێنەرەوەی ناکۆکیو ئاژاوەکەیە.[٣]

٢ـ بە خاتری قایمبوونی دڵیو کرانەوەی زارو زمانی، لاواز لە خۆت نزیك بکەوە.[٤] لێرە مەبەستی ئەوە نیە (لاواز) بخاتە پێش (بەهێز)ەوە، بەڵکو تەنها ویستوویەتی یەکسانیان لە نێوان ئەنجام بدرێتو زیاتر نا، چونکە (بەهێز) بە هۆی هێزەکەیەوە خۆی نزیك دەکاتەوە، بەڵام (لاواز) جەسارەتی ئەمەی نیە، (بەهێز) بە (بەڵگە)وە قسە دەکات، بەڵام ڕەنگ بێت لاواز لەم ڕووەوە دەستەپاچە بێت، لەبەر ئەمە لەسەر (دادوەر) پێویستە: بە مەبەستی

---

١ المصدر نفسه (ص: ٢١٥).
٢ المبسوط السرخسي (١٦/٦٦)، تهذيب إبن عساكر (٦/٣٠٦).
٣ نظام الحكم في الشريعة والتأريخ الاسلامي (٢/٤٦٥).
٤ المبسوط السرخسي (١٦/٦٦).

یەکسانکردنی لەگەڵ بەرانبەرەکەیداو بە هێزبوونی دڵو دەروونی‌و کرانەوەی زمانی‌و دەربڕینی بەڵگەیەك کە هەیەتی کەسی (لاوان) لە خۆی نزیك بکاتەوە.[1]

٣ـ چاودێری بابای غەریب –واتە خەڵکی دەرەوەی شار– بکە، ئەگەر چاودێری نەکەی واز لە مافەکەی دەهێنێت‌و، بۆ لای کەسوکارەکەی دەگەڕێتەوە، لەوانەیە ئەو کەسە هەقەکەی بفەوتێنێ کە نەچیێ سەری بەرز نەکاتەوە.[2] گوتراوە: ئەمە فەرمانکردنە بە پێشخستنی خەڵکانی (غەریب) بۆ لای (قازی) لە کاتە قەرەباڵغەکاندا: بابای (غەریب) دڵی بە لای خێزان‌و منداڵەکانیەوەیە، جا تا خێرا بگەڕێتەوە، پێویستە لەسەر دادوەر لە کاتی (دادوەری)دا پێشی بخات، پێغەمبەری خودا (ﷺ) چاودێری غەریبانی دەکردو مشوری لێ دەخواردن، گوتراویشە: مەبەستی (عمر) ئەمە بووە: بابای (غەریب) دڵشکاوە، جا ئەگەر (دادوەر) مشوری لێ نەخوات‌و چاودێری نەکات دەستەپاچە دەبێت‌و ناتوانێ بەڵگەی خۆی بخاتەڕوو، ناچار واز لە مافەکەی دێنێت‌و بەرەو لای کەسوکارو خاووخێزانی دەگەڕێتەوە، بەمە (دادوەر) چونکە سەری بۆ بەرز نەکردۆتەوە بۆتە هۆکاری لەدەستدانی مافەکەی.

٤ـ ئەگەر (دادوەر) نەیتوانی لەبەر ناڕوونی، کێشەکە یەکلابکاتەوە، هەوڵ بدە صوڵحیان لەنێواندا بکە.[3] ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە پێویستە لەسەر دادوەر کەسە ناکۆکەکان بۆ ئەنجامدانی (صوڵح) بانگهێشت بکات، بە تایبەتی لە کاتی وێکچوون‌و تێکەڵ‌و پێکەڵبوونی شتەکاندا.[4]

---

١ نظام الحكم في الشريعة والتأريخ الاسلامي (٢/٤٦٥).

٢ المصدر نفسه (٢/٤٦٥).

٣ المصدر نفسه (٢/٤٦٥).

٤ المصدر نفسه (٢/٤٦٥).

# باسی حەوتەم

## ( پۆلیس ) لە سەردەمی ( معاویە )دا

سەردەمی (معاویە) لە ڕووی (سیستەمی پۆلیس)ەوە گەشەسەندنێکی گەورەی بەخۆوە نیشانداو دامودەزگای پۆلیس لە ڕووی پێشکەوتن‌و دامەزراندنیەوە، وەکو دامەزراوەیەکی ڕەسمی لەسەر ئاستی دەوڵەت دەرکەوت، کە پێش ئەمە بەم شکڵ‌و شێوەیە دەرنەکوتبوو، لە بەرانبەر بەرقەرارکردنی ئاسایش‌و جێگیرکردنی پایەکانی دەوڵەت لە تەواوی وڵات‌و شارەکانی جیهانی ئیسلامدا بەرپرسیار بوو، ئەمە وەکو گرنگترین هێزی ناوخۆ (معاویە)و (والی)یەکانی بۆ دەستەبەرکردنی ئەمنی شەخسی لە لایەکەوەو پاراستنی حوکمەت‌و هێمنایەتی ناوخۆ لە لایەکی ترەوە پشتیان پێ دەبەست، وێڕای هەموو ئەمانەش، (دەزگای پۆلیس) بوو بە یەکەمین بەرگریکارو پاسەوانی سیستەمی ئاسایشی ئوممەوی‌و لە بەرانبەر هێرش‌و دەستدرێژی گروهە بەرهەڵستکارو هەڵگەڕاوەکانی وەك (خەواریج)و (شیعە)و هی تریش، کە بە گرتنەبەری هەموو ڕێبازو بەکارهێنانی هەموو ئامرازێك کاریان بۆ ڕوخاندنی دەکرد، ئەمەو (معاویە) (خودا لێی ڕازی بێت) (پۆلیس)ی وەك پاسەوانی تایبەتی شەخسی خۆی بەکاردەهێنا، بێگومان هەوڵ‌و پیلانە پوچەڵبوەکەی خەواریج بۆ ڕەشەکوژکردنی (معاویە) ڕۆڵێکی گەورەی لە هاندانی (معاویە)دا گێڕا تا پشت بە (پۆلیس) ببەستێت‌و، بۆ پاسکردن‌و پارێزگاریلێکردنی خۆی سوودی لێ وەربگرێت‌و دەستەبەری دووبارەنەبوونەوەی هەوڵێکی لەم جۆرەی پێ بکات، بە تایبەتی کە (عەلی)و (عمروی کوڕی عاص) بەر هەمان هەوڵی ڕەشەکوژی کەوتن‌و دەرەنجام لە ساڵی (٤٠)ی کۆچیدا (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران بە هۆیەوە کوژرا، ئیتر لەو کاتەوە (معاویە) بە بێ پاسەوانی تایبەت هەتا بۆ ئەنجامدانی نوێژەکانیشی دەرنەدەچوو، فەرمانی بە پاسەوانەکانی دەکرد بە خاتری پاراستنی لە هەر دەستدرێژیەکی چاوەڕوانکراو لە لایەن نەیارەکانیەوە، لە ژوور سەریەوە ڕاوەستن.[1]

یەکەم: (پۆلیس) لە عێراقدا:

(موغیرە) بە یەکەم والی دادەنرێت کە لە لایەن (معاویە)وە بەسەر (کوفە)وە دانرابێت، بە مەبەستی بەرقەراربوونی ئاسایش پشتی بە پیاوانی (پۆلیس) بەست‌و (قبیصەی کوڕی دمّون)ی کردە سەرۆکی دەزگای پۆلیس-ی شار- کە بە توندوتیژی‌و دڵڕەقی ناوی

---

١ تأريخ الطبري (٦/٦٥)، الشرطة في العصر الأموي (ص: ٣٦).

دەرکردبوو.[١] لەو ڕوداوانەی مەودای چالاکی (پۆلیس) دەردەخەن لە بواری پاراستنی ئاسایشو سیستەمی حوکمدا، (الطبري) سەبارەت بە ململانێی نێوان (موغیرە)و (خەواریج) دەڵێت: کاتێك سەرۆکی (پۆلیس) هەواڵی بە (مغیرە) ڕاگەیاند: کەوا (خەواریج) لە (کوفە) کۆبوونەتەوەو دەیانەوێت ئاژاوەو پشێوی بنێنەوەو شۆڕش بکەن، (مغیرە) فەرمانی بەسەر سەرۆکی (پۆلیس) دادا گەمارۆی شوێنی کۆبوونەوەکە بدات، ئیدی گەمارۆیدانو ڕاپێچی بەندیخانەی کردن.

لە (بەصرە)ش (معاویە) (عبدالله کوڕی عامر)ی کردە والیو، پاشان لە ساڵی ٤٥ی کۆچیدا لێی خستو (زیاد بن أبیە) لە جێ دانا، کاتێك (زیاد) گەیشتە (بەصرە) سەرنجی دا بارودۆخ یەجگار ئاڵۆزەو ئاسایش هەرەسی هێناوە، لە میانەی وتارێکی دوورو درێژیدا کە بە پێی نەریتی ئەو ڕۆژگارەو بۆ دەستپێکردنی کاروباری ویلایەتەکەی ئاراستەی دانیشتوانی شاری کرد، باسی ئەو بارودۆخە خراپەی کردو ئەو شێوازو ڕێبازەی تێدا ڕوونکردەوە کە لەمەولا لە بەرانبەریدا دەیگرێتەبەرو چارەسەری باری ئەمنی پێ دەکات، لەو وتارەدا (کە بە ئیزنی خودا لەمەولا قسەی لەسەر دەکرێت) وا دەخوێنرێتەوە کە (زیاد) بەچاونوقاندن لە بەرانبەر ئەو هۆکارو ئامرازانەی ئەم ئامانجەی پێ دەپێکێت سوورە لەسەر بەرپاکردنو پیادەکردنی ئاسایش.[٢] ئەگەر بە ستەمکردنیش بێت دەیەوێت ئەمە جێبەجێ بکات، کاتێك دەڵێت: من سوێند بە خودا دەخۆم: سەرپەرشتیکار لەباتی سەرپەرشتیکراو دەگرم، نیشتەجێ لە باتی دەوارنشین دەگرم، هاتوو لە باتی هەڵاتوو دەگرم، ساغتان لە باتی نەخۆشتان دەگرم، تا کار بەوە دەگات یەکێك بە براکەی دەگاتو دەڵێت: (سەعد) خۆت دەرباز بکە (سەعید) لەنێو چوو، یان ئەوەتە ڕێورەوشتان ڕێكو ڕاست دەبێت.[٣]

(البلاذري) سەبارەت بەوە کە چۆن لەسەردەمی (زیاد)دا بارودۆخی ئاسایشی (بەصرە) جێگیر ببوو! ! دەڵێت: ڕۆژێك زیاد گوێی لە غەڵبەغەڵبو مقۆمقۆیەکی نێو خەڵك دەبێ، پرسیاری لە هۆکاری ئەم دەنگو هەرایە کرد، پێیان وت کە: خەڵك دەیانەوێت پاسەوان بۆ ماڵەکانیان بە کرێ بگرن، دیارە ئەو کاتە پۆلیس بوونی نەبووەو دزیش پەرەی سەندووە،[٤] لە ڕۆژی دووەمدا (زیاد) فەرمانی بە سەرۆکی (پۆلیس) کرد کە دەبێت لە دوای نوێژی

---

١ تأريخ الطبري نقلا عن الشرطة في العصر الأموي (ص: ٣٧).

٢ الشرطة في العصر الأموي (ص: ٣٨).

٣ تأريخ الطبري (١٣٥/٦).

٤ أنساب الأشراف (١٧١/٤).

خەوتنانەوە پۆلیس بە نێو کۆڵانو ڕێگاکانی شاردا بڵاو بکاتەوەو پاسەوانی شاریان پێ بکات.[١] (البلاذري) دەڵێت: ئیدی (پۆلیس) نزیکەی (٥٠٠) پێنج سەد دزو تاڵانکەری ماڵانیان کوشتن،[٢] (زیاد) بە یەکەم کەس دادەنرێت لەوەدا کە دەرچوون لە ماڵو هاموشۆی شەوانەی قەدەغە کرلاد.[٣] فەرمانی بە سەرۆکی دەزگای (پۆلیس) دەکرد: شەوانە دەرچێتو بەنێو شاردا بگەڕێت، ئیتر دەگەڕاو هەر مرۆڤێکی دیبا دەیکوشت، شەوێك عەرەبێکی ڕەوەند دەگرێت، بۆ لای (زیاد)ی دێنێ، پێی دەڵێت: گوێت لە بانگەواز نەبووە؟ –مەبەستی بانگەوازی قەدەغەبوونی هاموشۆی شەوانە بووە–، دەڵێت: نە بە خودا، بە خۆمو وشترێکی شیردەرەوە بەرەو ئێرە هاتم، تاریکایی شەوم بەسەرداهات، ئەوم لە شوێنێك بەستەوەو خۆشم ویستم تا بەیانی لێرە بمێنمەوە، سەبارەت بە فەرمانی (ئەمیر)یش هیچم نەزانیوە، گوتی: بە خودا پێم وایە چۆن دەڵێی هەر وابێتو ڕاستگۆ بی، بەڵام کوشتنی تۆ چاکبوونی ئەم ئوممەتەی پێوەیە، ئیتر فەرمانی دەرکردو لە گەردنی درا،[٤] ئەگەر پاساوی زۆریش بهێنرێنەوە ئەوا شەریعەتی ئیسلام دان بە دروستی وێنەی ئەم کردارە ستەمکارانەدا ناهێنێت.[٥] وەکو دیارە کوشتنی کابرای دەشتەکی لەبەر ئەوە نەبووە حەزیان لە کوشتنی خودی خۆی بووبێت، نەخێر، بەڵکو بە خاتری ئەوە بوو قەناعەت بە خەڵکی (بەصرە) بکات کە والی لە جێبەجێکردنی فەرمانەکانیدا جیددیەو، هەر کەسێك لە قانون دەرچێت، ئەگەر پاکو بێ گوناهیش بێت ئەوا لە سزا دەربازی نابێت، هەروەك چۆن لە وتارە بێ حەمدو سەناکەیو هەڕەشە ئامێزەکەیدا ڕابورد، ئیدی دواین ئامانجی (زیاد) لەمەدا ئەوە بوو: سامو هەیبەتی دەوڵەت لە دڵو دەروونی هەموو لایەکدا جێگیر بکاتو گوێڕایەڵیو فەرمانبەرداری گشتیشی بۆ مسۆگەر بکات، ویستی ئەگەر بە بەکارهێنانی ترسو تۆقاندنیش بێت بەم ئامانجەی بگاتو بەم شێوازە کاروبارەکان جێگیرو ڕێکوپێك بکات، بە جۆرێك دانیشتوانی (بەصرە) بە چاوی خۆیان ببینن کە: سەپاندنی سزا شتێکە سازشی لەسەر ناکرێت.[٦]

---

١ المصدر نفسه (١٧١/٤).

٢ المصدر نفسه (١٧١/٤).

٣ الشرطة في العصر الأموي (ص: ٣٩).

٤ تأريخ الطبري (١٣٨/٦).

٥ ولاية الشرطة في الاسلام (ص: ١٢٣)، نمر بن محمد الحميداني.

٦ الشرطة في العصر الأموي (ص: ٤٠).

ئەمەو بە لای (زیاد بن أبیه)یەوە سەر لە نوێ ڕێکخستنەوەی دەزگای پۆلیس بە خاتری باڵکێشان بەسەر باری ئەمنیدا نادیدە نەبو، بۆیەو لەم پێناوەدا چەند هەنگاوی کرداری هەڵێنان و، پێهەڵابردنی ژمارەی چالاکوانانی دەزگای پۆلیس یەکێك بوو لە کارە یەکەمینەکانی،[١] کار بەوە گەیشت ژمارەیان گەیشتە چوار هەزار کەس و، لە جیاتی یەك دوو سەرۆکپۆلیسی بە سەرەوە دانان.[٢] بێگومان پێهەڵابردنی ژمارەی پیاوانی پۆلیس بۆ ئەم ئاستە بەرزە بەڵگەیە لەسەر دوو شتی گەورە:

یەکەم: توندیو پشێویو باری نێوخۆ.

دووەم: زۆرجار پۆلیس هاوکاری سوپای دەکرد،[٣] وریاییو هەستیاری (زیاد) گەیشتبوە پلەیەك کە بڵێ: ئەگەر لە نێوان منو خۆراسان گوریسێك بزر ببێت دەزانم کێ هەڵی گرتووەتەوە.[٤] ئیدی کارەکانی بە شێوەیەك توندوتۆڵ کردن تا ئەوەی کە (الطبري) بڵێ: ... زیاد یەکەم کەس بوو کاروباری لە (عێراق) توندو تۆڵ کردو، دەسەڵاتی بۆ (معاویه) یەکلایی کردەوەو، خەڵکی وادار کرد فەرمانبەرداری بنوێنێتو دەستپێشخەری لە سزاداندا کردو، شمشێری لە کێلان دەرکێشاو، بە گومان خەڵکی دەگرتو سزای لەسەر شتی ساغ نەبۆوە ئەنجام دا، بە ڕادەیەك خەڵك زۆری لێ دەترسان و، لە ئەنجامدا خەڵك هێندە لە یەکتر ئەمین بون،ئەگەر پیاوێك یان ژنێك شتێکی لێ کەوتبایە کەس زاتی ئەوەی نەبو هەڵی بگرێتەوە، هەتا خاوەنەکەی دەهاتەوەو هەڵی دەگرتەوە، ژن لە ماڵەکەی خۆیدا دەخەوتو دەرگای لەسەر خۆی دانەدەخست، ئیتر (زیاد) کاروباری خەڵکی بە شێوەیەك بەڕێوەبرد وێنەی نەبینرابو، خەڵك ئەوەندەی لە ئەو دەترسان لە کەس هەێندە نەترسابون. دەستی بەخشینی ئاوەڵا کردو شاری ڕزقو خۆراکی دروست کرد،[٥] لەو دەمەدا (معاویە) ویلایەتی کوفەشی خستەسەر ویلایەتی بصرەی سەر بە (زیاد)، ئەمەو (زیاد)یش توانی حکومەتی پۆلیسی بەسەر ناوچەکەدا بسەپێنێت، بە چەشنێك ئاسایشی (بەصرەو کوفە)ی سەقامگیر کردو سەرەنجام ئامانجو ئارەزوی ئومەویەکانی بەدی هێنان و، کارێکی وای کرد (دەزگای پۆلیس) لە ڕوی هێزو چالاکی نواندنەوە کاریگەرترین هێزی نێوخۆی لێ دەربچێت.[٦]

---

١ الشرطة في العصر الأموي (ص: ٤٠).

٢ تأريخ الطبري (١٣٦/٦).

٣ نظام الحكم في الشريعة والتأريخ والاسلام (٦٣٦/٢).

٤ المصدر نفسه (١٣٩/٦).

٥ المصدر نفسه (١٣٨/٦).

٦ الشرطة في العصر الأموي (ص: ٤١).

**دووەم: (پۆلیس) لە هەرێمەکانی دیکەدا:**

ئەگەر بێتو وڵاتێکی وەکو (مصر) لەگەڵ هەرێمێکی تری وەکو (بەصرە) بەراورد بکەین، بە حوکمی دوری خەڵکانی (خەواریج) لە مصر کە دەوری ئاژاوەگێڕی‌و پشێویان دەگێڕا، دەبینین (پۆلیس) ئەو رۆڵە گەورەی لە (بصرە)یدا گێڕاوە لە (مصر) نەیگێڕاوە، سەرچاوەکان باس لە داکۆکیکردنی والیەکان دەکەن لە کاتی هەڵبژاردن یان دیاریکردنی سەرۆکی (پۆلیس)دا.

لە سەردەمی (معاویە)دا (مەروانی کوڕی حەکەم)ی والی (مەدینە)، لە یەك کاتدا (مصعب ی کوڕی عبدالرحمن ی کوڕی عەوف)ی کردە سەرۆکی دوو دەزگای (دادوەری)و (پۆلیس).[١] (إبن سعد) دەگێڕێتەوە کە (مصعب) هەڵوێستی لە بەرانبەر تاوانکاران‌و سەرپێچیکارانی (قانون)دا توندو تیژ بو.[٢] (مصعب) هێندەی (پۆلیس) لەبەردەستدا نەبون تا بتوانێت بە گوێرەی پێویست ئەرکی پاراستنی شاری (مەدینە)یان پێ راپەرێنێت، بۆیە داوای لە (مەروانی کوڕی حەکەم) کرد: ئەگەر دەیەوێت پاراستنی ئاسایشی (مەدینە)ی بۆ مسۆگەر بێت، ئەوا دەبێت ژمارەیەکی زۆری پیاوانی (پۆلیس)ی بخاتە بەردەست،[٣] ئەمەو (مەروان) وەڵامی داواکەی دایەوەو (٢٠٠) دوو سەد (پۆلیس)ی بۆ نارد، بەم چەشنەو تا کۆچی دوایی (معاویە)، (مصعب) لەسەر پۆستی سەرۆکایەتی دەزگای (پۆلیس)ی (مەدینە) مایەوە.[٤]

**سێیەم: ئەرکەکانی (پۆلیس):**

بە هۆی ئەوە ئەم دەزگایە چەندین ئەرکی گەورەو گرنگی بۆ حکومەت‌و ئوممەت رادەپەراندن، جێگەو پێگەیەکی بەرزو بەرچاوی لە دەوڵەتی (ئومەوی)یدا هەبو، لە ڕستەی ئەو ئەرکانە:

١ـ پاسکردنی (خەلیفە)و (والی هەرێمەکان):

(معاویە)ی دامەزرێنەری دەوڵەتی (ئومەوی) بە حوکمی ئەوەی ململانێیەکی توندی سیاسی‌و سەربازی لەبەرانبەر خەواریج بەرپاکرد، یەکەمین کەس بوو بە خاتری دەربازبونی لە تیرۆرو رەشەکوژکرانی لە لایەن ئەو دوژمنانەیەوە، (پۆلیس)ی بۆ پاسکردنی خۆی بەکارهێنا، ئەو لە شوێنی نیشتەجێبونی‌و لە کاتی گەشتەکانیدا بە بەردەوامی لە لایەن

---

١ الشرطة في العصر الأموي (ص: ٤٣)، الطبقات (٥/١٥٨).

٢ الطبقات لإبن سعد (٥/١٥٨).

٣ الشرطة في العصر الأموي (ص: ٤٣)، الاغاني (٥/٧٤).

٤ المصدر نفسه (ص: ٤٣).

(پۆلیس)ەوە پاسەوانی لێ دەکرا، هەتا لە کاتی ئەنجامدانی نوێژەکانیشیدا پاسەوان لە ژوور سەریەوە ڕادەوەستاو، سەرۆکی پاسەوانەکانی بە شمشێری ڕوتەوە لە دەوروبەری هەڵدەسوڕا، بە هەمان جۆر (پۆلیس) پاسەوانیکردنی (والی هەرێمە جۆراوجۆرەکانی) لە ئەستۆدا بوو، (زیاد بن أبیه) پۆلیسی بۆ پاراستنی تایبەتی خۆی بەکاردەهێناو، سەرۆکی (دەزگای پۆلیس)یش لە بەرانبەر ساغ‌و سەلامەتی (والی)یدا بەرپرسیاری یەکەم بو.[1] کاتێك لە شوێنە گشتیەکاندا سەرۆکی پۆلیس لە پێشەوەی کەژاوەی کاروانی (خەلیفە) یان (والی) دەردەکەوت، ئەمە بە تیرێك دوو نیشانە دەشکێنران، یەکیان بەڵگە بوو لەسەر ئەوە (خەلیفە) یان (والی) پاسەوانی هەن‌و دەیپارێزن، دووەمیان: با خەڵك هەست بە سام‌و هەیبەت بکات، لە تەك ئەمەدا دەزگای (پۆلیس) ئامرازێك بوو بە دەست (خەلیفە)و (والی)یەوەو دەسەڵاتی خۆیان بەسەر ئەو کەس‌و گروهانەدا پێ دەسەپاند کە بە نیاز بون هەڵگەڕێنەوەو بەرهەڵستی بکەن.[2]

هەروەها پۆلیس لە کۆکردنەوەی زانیاریدا هاریکاری (خەلیفە)ی دەکرد، ئەمەو (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) هێندەی بایەخ بەوە دەدا کە بزانێت کاربەڕێوەبەرو ڕەعیەتەکەی چ دەکەن و بەچیەوە سەرگەرمن، بە خاتری ئەمە لە هەمو هەرێم‌و وڵاتێکدا چاودێری تایبەتی خۆی بڵاوکردنەوە، ئیتر بە شێوەی خولاو هەواڵی پێدەگەیشتن‌و، لە ژێر ڕۆشنایی ئەمەدا کاروبارەکانی خۆی ڕێك خستن‌و ماوەی دەسەڵاتەکەی درێژە پێدا.[3]

لەم پێڕەوەیدا (زیاد بن أبیه) لاسایی ئەوی کردەوە، دەربارەی (زیاد) گێڕدراوەتەوە: پیاوێك هاتەلای‌و سەبارەت بە پێویستیەکی قسەیەکی لەگەڵ کرد، وای زانی نایناسێت، بۆیە خۆی پێ ناساندو وتی: خودا ئەمیر ساغ‌و سەلامەت بکات، من فڵانی کوڕی فلانم، زیاد زەردەی هات‌و وتی: تۆ خۆت بە من دەناسێنیت، لە کاتێکدا خۆت هێندەی من خۆت ناناسی؟!، بە خودا خۆت‌و باوکت‌و دایکت‌و باپیرت‌و نەنکت دەناسم‌و، دەزانم ئەو جبەیەش هی کێیە کە لەبەرت کردوە، ئەوە هی فیسار کەسە...، کابرا زاری بوو بە تەڵەی تەقیو و واقی وڕماو خەریك بوو لە هۆش خۆی بچێت.[4]

---

١ تأريخ الطبري (١٣٨/٦)، الدولة الاموية في العصر الاموي (ص: ٧٩).

٢ الشرطة في العصر الأموي (ص: ٧٩).

٣ المحاسن والمساوي (ص: ١٤٣، ١٤٤)، للبيهقي.

٤ المحاسن والمساوي (ص: ١٤٤).

٢ـ سزادانی تاوانکاران‌و سنووربەزێنەرانی (قانون):

بە حوکمی ئەوە هێزی (پۆلیس) بەرپرسیاری سەرەکی پاراستنی ئاسایش‌و سیستەمی نێوخۆی شارەکان بوو، ئەرکی سەپاندنی قانونیشی لەسەر شان بوو، بەڵام باروودۆخی کۆمەڵایەتی نێو شارە گەورەکان وای لە (پۆلیس) دەکرد هەڵوێست‌و هەنگاوی توندو تیژ لە ئاقار خەڵکی عامەدا بنوێنێت‌و بنێت، (زیاد بن أبیە)ی والی (عێراق) لە وتارە بێ حەمدو سەناکەیدا کە لە لایەن خەڵکەوە ئەنجام دەدران‌و، وتی:.... هەر کەسێکتان شەو بەسەریدا بدرێت ئەوا هەچ شتێکی بفەوتێ‌و ببرێت من بۆی دەبژێرم، تکایە خۆتان لە گەڕان‌و سوڕانی شەو بپارێزن، هەر شەوگەڕێکم بە گیراوی بۆ لا بهێنرێت خوێنی دەرێژم،... چەندین کارەسات‌و ناونەتەوە، بۆ هەر تاوان‌و سەرپێچییەك سزایەکمان داناوە، هەر کەسێك یەکێك لە ئاودا بخنکێنێت دەیخنکێنینەوە، هەر کەس ئاگر لە یەکێك بەردا دەیسووتێنینەوە، هەر کەس خانوییەك ببڕێت‌و کونی بکات، ناو دڵ‌و هەناوی کون دەکەمەوە، هەر کەسێك گۆڕێك هەڵداتەوە بە زیندوویی دەیخەمە ناویەوە،[1] ... لەم وتارەدا ئاستی پشێوی‌و ئاڵۆزی شاری (بەصرە)مان لە میانەی سروشتی ئەو تاوانانەوە بۆ دەردەکەوێت کە بەر لە هاتنی (زیاد) لە لایەن هەندێك ئاژاوەچی‌و گێچەڵفرۆشەوە ئەنجام درابون، کاتێك لە وتارەکەی بۆوە، فەرمانی بە (سەرۆکی پۆلیس) کرد پاسەوان لەسەر ڕێگاو کوچەو کۆڵانەکان دابنێت‌و هەر کەسێکیشیان بە شەو لە دەرەوەی ماڵی خۆیدا دەستگیر کرد بیکوژن،[2] (البلاذري) دەگێڕێتەوە: کە (زیاد) لە بەرانبەر جێبەجێکردنی هەڕەشەکانیدا دڕدۆنگ نەبوو خاڵ بە خاڵ‌و پیت بە پیت بە ئەنجامی دەگەیاندن.[3]

٣ـ جێبەجێکردنی سزا شەرعیەکان:

یەکێکی تر لەو ئەرکانەی کە دەبوایە (پۆلیس) جێبەجێیان بکات، بریتی بوو لەو سزا شەرعیانەی کە لە لایەن (دادوەران)ەوە بە دژی ئەو کەسانە دەردەچون کە دەیانەویست کۆمەڵگای ئیسلامی گەندەڵ بکەن‌و خراپەی تێدا بڵاوبکەنەوە، وەکو زانراوە سزا شەرعیەکان (الحدود الشرعیة) لە قورئانی پیرۆزو سوننەتی بە پێزدا بەیان کراون، هاوەڵان‌و شوێنکەوتوان (ڕەزای خوایان لێ بێت) بەوپەڕی غیرەت‌و داکۆکی کردنەوەفەرمانەکانی

١ تأريخ الطبري (١٣٦/٦).
٢ الشرطة في العصر الأموي (ص: ٨٣)، أنساب الأشراف (١٧٢/٤).
٣ الشرطة في العصر الأموي (ص: ٨٣).

دینیان ڕادەپەڕاندن، لەم بارەوە پێشەوا (مالك) دەگێڕێتەوە: بینیان کۆیلەیەك نەمامە خورمایەکی دزیوە، بۆ لای (مەڕوانی کوڕی حەکەم)یان برد،[1] (مروان) کۆیلەکەی بەند کردو ویستی دەستی ببڕێت، خاوەنی کۆیلەکە چوە لای (ڕافع ی کوڕی خدیج) سەبارەت بە ئەمە پرسیاری لێکرد، ئەویش هەواڵی پێدا کە: ئەو گوێی لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بووە فەرمویەتی: ((لا قطع في ثمر ولا كثر))[2] واتە: بڕین‌و دزینی هێشووە خورمای بە دارەوەو گوڵوکە خورمای بە سەرەوە دەست بڕینیان لەسەر نیە، جا (مەڕوان) بە دوای کۆیلەکەیدا ناردو ئازادی کرد، بەم تیلەچاوە بۆمان دەردەکەوێت: کە (والی)و (کاربەڕێوەبەر)ەکان چەندە ڕێزیان لە هاوەڵانی بەڕێز ناوە، ئەگەرچی خۆشیان لە کاروباری (ویلایەت) هەڵقورتاندبێت، بەڵام چونکە بە بەڵگەی شەرعیەوە ئەم کارەیان کردووەو سوربون لەسەر جێبەجێکردنی فەرمانی خوداو پێغەمبەرەکەی ئەوا ئەوانیش نەك هەر لە ڕوویان هەڵنەگەڕاونەتەوە، بەڵکو بە سینگفراوانیەوە لێیان قبوڵ کردوون،[3] یەکێکی تر لە نیشانەی غیرەت‌و هەڵبژاردنی فەرمانی دین بەسەر فەرمانی شەخسیەوە: (مصعب ی کوڕی عبدالحمن ی کوڕی عەوف) (ڕەزای خوایان لێ بێت) سەرۆکی دەزگای پۆلیسی (مەدینە) بوو، (ئەمیر)ی شاری (مەدینە) فەرمانی پێکرد: خانووبەرەکانی (بەنی هاشم)و ئەوانەی دەکەونە نێو ئەوانیشەوەو، هی (بەنی ئەسەدی کوڕی العزّي) بە حوکمی لایەنگرییان لە (حسینی کوڕی عەلی)و (عبداللە ی کوڕی زوبێر)و بەیعەت نەدانیان بە (یەزید) بڕوخێنێت‌و تەنگیان پێ هەڵبچنێت، (مصعب) فەرمانەکەی ڕەت کردەوەو بە (عمروی کوڕی سعید)ی ئەمیری (مەدینە)ی وت:[4] ئەی ئەمیر: ئەمانە بێگوناهو تاوانن‌و کاری وا ناکەم، (ئەمیر) پێی وت: هۆ کوڕی (أم حريث) سیحرەکەت بەتاڵکەرەوەو شمشێرەکەتمان بدەوە!، شمشێرەکەی بۆ هەڵداو لە لای دەرچوو[5] ئەم کردارە بەڵگەیە بۆ بەهێزی ئیمانی (مصعب)، چونکە نابێت لەسەر حیسابی سەرپێچیکردنی خودادا گوێڕایەڵی بۆ مەخلوق بکرێت،[6] ئەرکێکی تری

---

١ ولاية الشرطة في الاسلام.

٢ كَثَر: بریتیە لە گولوکی بەری دارخورما–شیلەیەکی سپی شیرینی لەنێودایەو دەخورێت– الفائق في غريب الحديث (٣/٤٤٧).

٣ ولاية الشرطة في الاسلام (ص: ١٢١).

٤ نسب قريش (ص: ٦٨)، ولاية الشرطة في الاسلام (ص: ١٢٢).

٥ نسب قريش (ص: ٢٦٨)، ولاية الشرطة في الاسلام (ص: ١٢٢).

٦ الشرطة في العصر الأموي (ص: ١٢٢).

پۆلیس: هاریکاری کردنی سوپا بوو بۆ بەگژداچوونەوەی دوژمنانی دەوڵەتو،[١] جێبەجێکردنی حوکمی کوشتنو سزادانی نەیارانی سیاسیو سەروکارکردنی زیندانیانو هەر کارێکی تر کە پەیوەندی بە سەرۆکی زیندانەوە بوو،[٢] هەرچەندە نیشانەکانی ئەم ئەرکانەی دوایی زیاتر لە سەردەمانی خەلیفەکانی دوای (معاویە)دا دەردەکەون.

**چوارەم: چەند هێزو دامەزراوەیەکی ترو پەیوەندیان بە (پۆلیس)ەوە:**

(پۆلیس) بە بڕبڕەی پشتی دەزگای ئاسایشی دەوڵەتی ئومەوی دادەنراو، ئەرکی سەرەکی وپلەیەکی بریتی بوو لە پاراستنی ئاسایشی نێوخۆ، هاوکات لەگەڵ هەبوونی ئەم دەزگایەدا، چەند دەزگایەکی تریش لەنێو دەوڵەتی (ئومەوی)دا هەبوون رۆڵی هاوشێوەو تا رادەیەك تەواوکەری کارەکانی (پۆلیس)یان دەگێڕا، ئەو دەزگایانە ئەمانە بوون:

١ـ پاسەوان (الحرس): لە سەرەتاکانی سەردەمی (ئومەوی)دا وشەی پاسەوان (حەرەس) بۆ ئەو کەسانە بەکاردەهێنرا کە ئەرکی پاسەوانی یان جێبەجێ دەکردو چاو لەوە دەقوچێنرا کە پاسی کوێ یان کێ دەکەن، ئەمەو لەم سەردەمەدا پاسەوانەکان خۆیان لەو تاقمەدا دەنواند کە پارێزگاریان لە (خەلیفە)و (والی)یەکان دەکرد، وەکو دیارە (معاویە) یەکەمین خەلیفەی (ئومەوی) بوو بە مەبەستی بەرپەرچدانەوەی ئەرکی هەر هێرشێك کە لە لایەن (خەواریج)و خەڵکانی ترەوە دەکرێتە سەری پاسەوانی تایبەت بە پاراستنو پاسکردنی خۆی دانان، والیەکانیش لە سەردەمی (معاویە)دا بە تەك هێزی (پۆلیس)ەوە (پاسەوان) یان وەکو هێزێکی ئەمنی نێوخۆ بەکارخست، (زیاد بن أبیه) پێنج سەد پیاوی لە هێزی پاسەوان تایبەت کردن بە پاسەوانی کردنی خۆیەوەو پیاوێکی لە هۆزی (بەنی سعد) بۆ سەرۆکایەتیکردنی ئەم هێزە تەرخان کردو ناوی (سەرۆکی پاسەوانان)ی بەسەردا بڕی،[٣] لەو کاتەوە (خەلیفەکانی ئومەوی) متمانەیان لەسەر کێ هەبوایەو بۆ ئەم کارە تێیان ڕادیبایە دایان دەمەزراند.[٤]

پوختەی قسە: چەمکی (پۆلیس) تا ئەو شوێنە فراوان دەبێت کە چالاکیەکانی (پاسەوان)ی دەخستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، ئەمە لە کاتێکدا (پاسەوان)ەکان نەدەهاتنە

---

١ المصدر نفسه (ص: ٩٧).

٢ المصدر نفسه (ص: ٩٧ـ١٠٩).

٣ تأريخ الطبري، نقلا عن الشرطة في العصر الأموي (ص: ١٢٨).

٤ الشرطة في العصر الأموي (ص: ١٢٨).

نێو چوارچێوەی (پۆلیس)ەوە.[١] سەبارەت بە ئەمە (الجاحظ) لە نیوەدێڕە شیعرێكداو بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت ئەم دوو دەزگایە لێك جودا بون دەڵێت: ((كأنه شرطيٌّ بات في حرس)) واتە: هەر دەڵێی (پۆلیس)ەو شەوی لە (پاسەوان)یدا كردۆتەوە.[٢]

٢ـ (پاسەوان)ی ناعەرەب:

عەرەبەكان بەر لە بەرپابوونی دەوڵەتی (ئومەوی) چەند وشەیەكی بیانی فێر ببوون‌و بۆ ئەو كەسانەیان بەكاردەهێنان كە لە (بصره) پاسی (بیت المال)یان دەكرد،[٣] وشەو زاراوەكان بریتی بوون لە: (ئەساویرە، سیابجە، زەط)، (البلاذري) لێكیان دەداتەوەو دەڵێت: (الأساورة) پاسەوانی (فارس) بوون‌و، (السيابجة و زط) بەو پاسەوانانە دەوتران كە لە (هیند)ەوە هاتبوون،[٤] لە مێژووی خیلافەتی (ئومەوی)ەوە دەردەكەوێت كە (والی)یەكانیان بە ئامانجی سەركوتكردنەوەی خەڵكانی ڕاپەڕیوو بەرهەڵستكار چەند تاقمە ڕەگەزێكیان بەكارهێناون‌و، بە گوێرەی ڕیوایەتی (البلاذري) ناوی (البخارية)یان بەسەردا دابڕاوە، (عبیدالله ی كوڕی زیاد)ی والی (خۆراسان) لە میانەی جەنگێكدا ژمارەیەكی زۆر لە خەڵكی (بوخارا) بە دیل دەگرێت‌و، كاتێك دەكرێتە والی عێراق لەگەڵ خۆیدا دەیانهێنێتە (بصره)و لەوێ نیشتەجێیان دەكات‌و بە چەشنی هۆزە عەرەبەكان موچەیان بۆ دەبڕێتەوە،[٥] هێزێكیان لێ دروست دەكات‌و بە خاتری قەڵاچۆكردنی (خەواریج)و دامركاندنەوەی شۆڕشەكەیان لەگەڵ (هێزی پۆلیس) بەكاریان دەهێنێ.[٦] هەرچی (إبن سعد)ە دەڵێت: (بوخاریە) بۆ یەكەمین جار لەسەر دەستی (زیاد)ی باوكی (عبیدالله)و لە كاتی ویلایەتی خۆیدا وەكو هێزێكی ئەمنی بەكارهێنرا، ئینجا دەڵێت: (زیاد) لە هەوڵی قۆڵبەستكردنی (حجری كوڕی عدی) (ڕەزای خوای لێ بێت)دا هێزی (بوخاریە)ی بە پشتیوانی (پۆلیس) بەكارهێنا،[٧] (البلاذري)یش: بە شان‌و باڵی هێزی (بوخاریە)دا هەڵدەڵێت‌و شارەزایی ئەوان لە

---

١ المصدر نفسه (ص: ١٣٠).

٢ الحيوان (٣/١٥٨)، الشرطة في العصر الأموي (ص: ١٣٠).

٣ الشرطة في العصر الأموي (ص: ١٣٠).

٤ المصدر نفسه (ص: ١٣٠).

٥ المصدر نفسه (ص: ١٣٠).

٦ الطبقات لإبن سعد نقلا عن الشرطة في العصر الأموي (ص: ١٣١).

٧ البلاذري، الانساب، نقلا عن الشرطة في العصر الأموي (ص: ١٣١).

بواری (تیراندازی)دا باس دەکات،[1] بە گوێرەی گێڕانـەوەی سەرچـاوەکان، بـەکارهێنانی ئـەم تاقمە وەکو هێزێکی مرۆیی بـەس لەسـەر والیـەکان کـورت هەڵنـەهاتبوو، بـەڵکو هەنـدێك لـە پیاوماقوڵانیش بۆ خزمەتکردنی خۆیان بەکاردەهێنان، بۆ نموونە لە شاری (بصره): کـوڕانی (عبدالله ی کوڕی عامر)ی والی پێشووی عێراق هێزی (بوخاریە)یان وەکـو پاسـەوانی تایبـەتی خۆیان بەکاردەهێنا.[2]

٣ـ عورەفا (العرفاء):

بـەو نـەزەرەی کـە (عـەریف)ەکـان بـە لای (والـی)یەکانـەوە خـاوەن پێگـەی بـەرزبوونو هەندێکیان دەیانتوانی کاریوا ئەنجام بدەن کە لە توانای خەڵی سادەدا نەبوون، لـە لایـەکی تریـشەوە چـونکە (عـەریف)دەربـارەی چـاودێریکردنی جموجـۆڵی خـەڵك بەرپرسـیار بـوو، دەبووایە دەسەڵاتی لە جموجۆڵی گوماناوی خەڵك ئاگادار کردبایەوەو، لەسەری پێویست بوو هەموو ئەو کەسو گرۆهانە بناسێت کـە سـەبارەت بـە هـەوادارییان بـۆ دەوڵـەت گومانیـان لێ دەکرێت، لەبەر ئەمە ئەم پۆستە پێگەیەکی جەماوەری نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا پیاوانی گـەورەی نێـو هۆزەکـان ئامـادەبوون وەری بگـرن، (إبـن سـعد) لـە (طبقـات)ەکەیـدا نـاوی کەسانێکی زۆری ڕیز کردووە کە ئەم پۆستەیان وەرگرتووە.[3]

٤ـ لێسەنەرەوەو سزادەر (صاحب الاستخراج أو العذاب):

لە سەردەمی (ئومەوی)یدا لایەنێکی تایبەت بە گێڕانەوەی ئەو پارەو سامانانە دروستکرا کە لە لایەن کاربەدەستانی دەستپیـسەوە دەدزرانو پاشـقول دەدران، ئـەو کەسـەی ئـەرکی سزادانی پاشقولدەرانی لە ئەستۆدا بـوو دەبووایـە کـارێکی وایـان بەسـەر بێنێـت تـا دان بـە دزیەکـەیانو شـوێنی تێـدا حەشـاردانی سـامانەکە دا بنـێن ، ئـەو پێـی دەوتـرا: (صـاحب الاسـتخراج) واتـە لێـسەنەرەوە یـان دەرهێنـەرەوەی ئـەو سـامانەی لـە چـاڵی دزیـدا شاردراوەتەوە.

(إبن قتیبة) دەڵێت: ئـەم پیـشەیە لـە سـەردەمی (زیـاد بـن أبیـە)دا دەرکـەوت، ئـەو لـە بەرانبەر کاربەدەستە ئیداریەکانیـدا هەمیـشە لەسـەر هەسـت بـوو، ئەگـەر هاتبـاو (ناپـاکیو

---

١ المصدر نفسه (ص: ١٣١).

٢ المصدر نفسه (ص: ١٣٣).

٣ عیون الاخبار (١/٥٥)، الشرطة في العصر الأموي (ص: ١٣٤).

دەستپیسی)یان لێ دەرکەوتبا بەبێ دوودڵیو دوای سزادانێکی چاك لە پۆستەکانی دادەبەزاندنو لێی دەخستن.[1]

زۆرێك لە مێژوونووسان ڕووداوگەلێك سەبارەت بەبەکارهێنانی (صاحب الاستخراج= سزادەرو لێسێنەرەوە) لە لایەن والیەکانەوەو بۆ گێڕانەوەی ئەو سەروەتو سامانانە دەگێڕنەوە کە لە لایەن کاربەدەستانی دەست پیسو پاشقولدەرەوە دزرابوون، بۆ وێنە: (عبیداللە ی کوڕی زیاد)ی والی (عێراق) یەکێك لە یاریدەدەرانی خۆی بە ناوی (عبدالرحمن) لە پۆستەکەی دابەزاندو (٢٠٠) دوو سەد هەزار درهەم پارەی دزراوو پاشقولدراویشی لێ سەندەوە،[2] بە هەمان چەشن بڕی (١٠٠) سەد هەزار درهەمی تری لە دەست کاربەدەستێکی باڵای حوکومەتەکەی ڕزگار کردەوەو هێنایەوە نێو (بیت مال).[3]

٥ـ دەزگای (حسبة):

لێرەدا مەبەست لە (حسبة) تەنگ پێهەڵچنینە، واتە: کاری چاودێریکردنو ڕێکخستنی بازاڕو کاروبارە بازرگانیەکانی نێویەتی، ئەرکەکانی(محتسب) لە دەوڵەتی (ئومەوی)یدا بریتی بوون لە: سەندنی گومرکو زەریبەی کاڵا بازرگانیەکانو کۆکردنەوەی کرێی دوکانەکانی سەر بە دەوڵەت،[4] وێڕای تەواوی بەرپرسیایەکانی بازاڕ، کە دیارترینیان ئەمانە بوون:

أـ داکۆکیکردن لەسەر ڕێکوپێکی وردەکاری (تەرازوو) وتەواوی ئامڕازە باوەکانی کێشانەو پێوانەی نێو بازاڕی ئەو سەردەمەو بەرگرتن بە ڕودانی دۆڕان لە مامەڵەدا.

ب ـ بەسەرکردنەوەی کتوپڕی کیلۆو تەرازوو پێوانەکان، نەبادا بەلایەکیان بەسەردا هاتبێتو تێك درابن.

ج ـ ڕێگرتن لەبەردەم بەرزبوونەوەی ناقۆڵای کەلوپەلو کاڵا بنەڕەتیو زەروریەکان.

دـ بەرگرتن بە حاڵەتی پاشقولدان -ئەگەر ڕوویدابایە- و ناچارکردنی پاشقولدەر بۆ خستنە بازاڕو فرۆشتنی کاڵاو شمەکە کەڵەکە بووەکەی.

بە گوێرەی ئەم چەمكو واتایە: دەبینین لە سەرەتای دەوڵەتی (ئومەوی)یدا ژیانو گوزەرانی ئابووری سادەو ساکار بووەو، لە هەموو هەرێمەکاندا والیەکان شوێنهەڵگری

---

١ الشرطة في العصر الأموي (ص: ١٣٤).

٢ المصدر نفسه (ص: ١٣٤)، نقلا عن الانساب للبلاذري.

٣ التطور الاقتصادي في العصر الاموي (ص: ٢٢٣).

٤ الادارة في العصر الاموي (ص: ٢٢٣).

بەرنامەی (خیلافەتی ڕاشیدە) بوون‌و، تا ئەوەی بە خودی خۆیان کاری (حسبة)یان ئەنجام دلوە.[١]

بەڵام ئەمە لە سەردەمی ویلایەتی (زیاد بن أبیه) (٤٥ــ٥٣ ك)یدا بەسەر (عێراق)ەوە نەبیووە ڕێگر لەبەردەم دانانی کارمەندێك بەسەر بازاڕی شاری (بصره)وە.[٢]

لە میانەی ئەم بەدواداچوونەدا، دەتوانین بڵێین: کە هەر لە سەرەتای سەردەمی (ئومەوی)یەوە سیستەمی (حسبة)ش هەبووە، بەڵام بەم وشەو زاراوە نەبووە، بێگومان بە درێژایی ئەو سەردەمە (محتسب) ڕۆڵی خۆی لە ڕێکخستن‌و ڕێکوپێککردنی کاروباری‌بازاڕدا گێڕاوەو، بە گوێرەی پێشکەوتنی کەرتەکانی (بازاڕو بازرگانی)یش سیستەمەکە گەشەی سەندووە، تێبینی دەکرێت کە لە سەرەتای کاردا (والی) بە خودی خۆی سەرپەرشتی کارەکانی (حسبة)ی کردبن‌و ڕاپەڕاندبن، ئینجا کارەکە بەرەوپێش چووەو وای خواستووە کە کەسێکی دیاریکراو دابمەزرێنرێت‌و ئەرکی چاودێریکردن‌و سەرپەرشتیکردنی بەرو بازاڕ جێبەجێ بکات، دوایش کارەکە زیاتر گەشەی سەندو کار بەوەگەیشت کە پێویستە ئەم (کارمەندە) ژمارەیەك کەسی لەگەڵ بن‌و لە کارەکانیدا یارمەتی بدەن.[٣]

٦ــ سیستەمی چاودێری (المراقبة):

ئەم سیستەمە لە سەردەمی (معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان) (ڕەزای خوای لیّ بێت)و لە شاری (دمشق)دا بە چەند شێوەیەك خۆی دەرخست:ــ

أــ پابەندکردنی هەندێك لە نەیارە سیاسیەکانی بە ئەنجامدانی نوێژی جەماعەت لە چەند مزگەوتێکی دیاریکراودا،[٤] ئەمە زیاتر بەوە دەچێت کە: لە سەردەمی ئیمڕۆدا کەسانی گومانلێکراو وادار دەکرێن کە لە کاتی دیاریکراودا سەردانی مەڵبەندەکانی (پۆلیس) بکەن.[٥]

ب ــ بۆ چاك چاودێریکردنیان هەندێك لە نەیارە سیاسیەکانی لە چەند خانووبەرەیەکی تایبەتی شاری (دیمەشق) نیشتەجێ کردبوون.

ج ــ چاودێریکردنی جیدیانەی ئەو بێگانانەی دێنە نێو وڵاتی ئیسلامەوە.[٦]

١ التطور الاقتصادي في العصر الاموي (ص: ٢٢٣).
٢ المصدر نفسه (ص: ٢٢٤).
٣ المصدر نفسه (ص: ٢٢٤).
٤ ولاية الشرطة في الاسلام (ص: ١٢٥).
٥ المصدر نفسه (ص: ١٢٥).
٦ المصدر نفسه (ص: ١٢٥).

٧ـ دامەزراوەی (الدرك):

واتازاراوەییەکەی (الدرك) ئەمەیە: دامەزراوەیەك بوو هەموو ئەو هێزە دەوڵەتیانەی لەخۆ دەگرت کە لە پێناوی پاراستنی سنووری دەرەوەی شارە گەورەکان کاریان دەکرد.[١] بەپێی دەقێکی مێژووی (الطبري): (زیاد) لە ساڵی ٤٥ی کۆچی‌و لە رۆژگاری (معاویە)دا بایەخی بە رێگاوبانەکان داوە، تێیدا هاتووە، کە بە زیاد وترا: رێگاکان مەترسیدارن، لە وەڵامدا وتی: جارێك جگە لە شار بایەخ بە هیچ شوێنێکی تر نادەم، ئەگەر دەسەلاتم بەسەر (شار)دا شکاو چاکم کرد، دوایی دەتوانم چاکتر بەسەر شوێنانی تردا زاڵ ببم، جا کاتێك ئاسایشی شاری مسۆگەر کردو کاروبارەکانی رێکخستن، دەستی بە کارەکانی تر کردن‌و بە دانایی رێکی خستن،[٢] ئەو دەیوت: ئەگەر لێرەوە تا خۆراسان گوریسێك ون ببێت، دەزانم کێ هەڵی گرتۆتەوە،[٣] ئەمە تەنها بەوە بووە کە پیاوەکانی دەسەلاتی تەواویان بەسەر رێگاوبانەکاندا شکاوە،[٤] ئەمەو (زیاد) بیردۆزەیەکی ئەمنی پێشنیار کرد کە خۆی لەم دوو هەنگاوەدا خستەڕوو، یەکەم: هێمن‌و هێورکردنەوەی نێوخۆی شارەکان‌و، دووەم: فراوانکردنی ئەم هێمنایەتیە بۆ دەوروبەری شارەکان‌و بە جۆرێك رێگاوبانەکانیش بگرێتەوە، ئەمانەی خستماننە روو چەند نیشانەو سیمایەکی روخساری سیستەمی (پۆلیس)ی سەردەمی (معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان) (رەزای خوای لێ بێت) بوون.

---

١ نظام الحكم في الشريعة والتأريخ والاسلام (٢/٦٤٣).

٢ تأريخ الطبري (٦/١٣٩).

٣ المصدر نفسه (٦/١٣٩).

٤ نظام الحكم في الشريعة والتأريخ والاسلام (٢/٦٤٤).

## باسی هەشتەم: والیەکان‌و ئیدارە لە سەردەمی معاویە (ڕەزای خوای لیٚ بیٚت):

(معاویە) (ڕەزای خوای لیٚ بیٚت) بەدرێژایی سەردەمی خیلافەتی خۆی هەوڵیدا شێوازی حوکومەتکردنی لە نێوان مەرکەزی‌و لامەرکەزیدا بێت‌و (دیمەشق)ی کردە پایتەختی دەوڵەت‌و، کردی بە مەڵبەندی سەرەکی فەرمان‌و بڕیارە سیاسی‌و ئابووری‌و ئیداریەکانی، بەڵام ڕێکخستنی نێوخۆی هەرێمەکانی دا بە دەست خودی والیەکانی‌و، بەمە واداریکردن هەر کەسەیان بە گوێرەی شارەزایی‌و لێهاتوویی خۆی کارەکانی ڕاپەڕێنێت‌و ڕاستەوخۆش لەبەردەم (معاویە) (ڕەزای خوای لیٚ بیٚت)دا بەرپرسیار بێت‌و هەق‌و حیسابی خۆی لەگەڵدا بکرێت، ڕەنگ بیٚ یەکێك لە هۆکارەکانی هەڵبژاردنی (دیمەشق) وەکو پایتەختی دەوڵەت لە لایەن (معاویە)وە ئەمەبێت: کە ئەو زۆر بە چاکی دانیشتوانی شامی ناسیبێت‌و متمانەی تەواوی لەسەر بووبن‌و زانیویەتی بە جیددی لایەنگری لیٚ دەکەن، معاویە (ڕەزای خوای لیٚ بیٚت) نزیکەی بیست ساڵ بە سیفەتی والی ژیانی خۆی لە وڵاتی (شام) بەڕێکردبوو، لە میانەی ئەمەدا پێگەیەکی بەرزو فراوانی جەماوەری بۆ دروست ببوو، پیٚ دەچێت دەرکی بەوە کردبێت بە بەردەوامبوونی دەوڵەتی ئومەوی بە شێوەیەکی سەرەکی‌و پلەیەك لەسەر ئاستی ئەو هاریکاری‌و پشتیوانیە تایبەتیە پەکی کەوتووە کە دەبێت لە لایەن دانیشتوانی (شام)ەوە پێشکەشی بکرێت، بەڵیٚ معاویە (ڕەزای خوای لیٚ بیٚت) هەموو ئەمانەی لە مێشکی خۆیدا دانابون‌و چاك لێیان حاڵی ببوو، لەبەر ئەمە هەر لە سەرەتادا هەوڵی دا هاوسەنگی نێوان سەرۆك‌و پیاوانی هۆزە عەرەبە جیاجیاکانی شام بە تایبەتی هۆزە یەمانی‌و قەیسیەکان بپارێزێت‌و،[1] بەوپەڕی توانای خۆی هەوڵی دەدا تاتەرازووی بەرژەوەندیەکانی ئەم دوو هۆزە بە لادا نەکەون‌و بەرژەوەندیەکانیان تێك نەگیرێن، لە هۆزی (قەیسی) پیاوگەلێکی زۆری وێنەی: (زوحاکی کوڕی قەیسی فەهری‌و حبیب ی کوڕی موسلیمەی فەهری)ی لە خزمەتدا بوون، بە هەمان شێوە لە هۆزی (یەمانی)یش پیاوانێکی زۆری وێنەی: (مالکی کوڕی هەبیرەی سکونی‌و، شرحبیلی کوڕی سەمتی کیندی‌و حسان ی کوڕی بەحدەلی کەلبی) لە خزمەتدا بوون، ئەمەو معاویە لە ماوەی هەردوك سەردەمی ویلایەت‌و خیلافەتەکەیدا لە لایەن ئەم دوو هۆزەوە بە جیددی پشتیوانی لیٚ دەکراو، بە تەك ئەوەوەو لە ژێر تاکە فەرمان‌و بڕیاری ئەودا دەجەنگان.[2]

---

١ خلافة معاوية بن ابي سفيان، العقيلي (ص: ٧٠).

٢ المصدر نفسه (ص: ٧٣).

سیاسەتی معاویە ئاوا بوو، پشتی بە خزمە نزیكەكانیو كەسایەتیەكانی نێو بنەماڵەی ئومەوی دەبەست وەك: عەنبەسەی كوڕی ئەبی سوفیانو عوتبەی كوڕی ئەبی سوفیانو، وەلیدی كوڕی عوتبەی كوڕی ئەبی سوفیانو، سەعیدی كوڕی عاصی كوڕی ئومەییەو، مەڕوانی كوڕی حەكەمو، عبدالملك ی كوڕی مەڕوانو،[١] عەمروی كوڕی سەعیدی كوڕی عاصو[٢] غەیری ئەمانیش، هەروەها (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) پێداگیر بوو لەسەر هەڵبژاردنی كەسانی ئەزموندیدەو شارەزا لەنێو موسڵماناندا تا بیانكاتە پشتیوانی خۆیو پۆستی (ویلایەت)یان پێ ببەخشێت، عبدالله ی كوڕی عامری كریزو، موغیرەی كوڕی شوعبەو، نەعمانی كوڕی بەشیری ئەنصاریو، موسلیمەی كوڕی موخلەدی ئەنصاریو،[٣] كەسانی تریش نموونەی ئەو جۆرە كەسایەتیانە بوون كە (معاویە) بۆ پۆستە باڵاكانی دەوڵەت هەڵیبژاردبوون، خۆشویستنو چارەویستن دوو بنەمای هەرە گرنگو تاكە پێوانە نەبوون لە لای معاویە بۆ هەڵبژاردنی ئەو جۆرە كەسانەو پەسەندكردنیان بەسەر خەڵكانی تردا، زۆرینەی ئەم كەسایەتیانە لە پێشدا خزمەتی (ئەبوبەكرو عمر)یان كردبوو، ئەویش پێی وابوو كە پێویستە سوود لە هەوڵو تەقەلاو لێهاتوویيو شارەزاییەكانیان وەربگرێتو، بە تایبەتی هی ئەو كەسانەیان كە ڕووداوەكانی فتوحاتی شام بەدەری خستبوون[٤] وەكو تێبینی دەكەین، (معاویە) پشتی بە خەڵكانی شایستەو لێهاتوو و دۆستی گیانی بە گیانی خۆی بەستووەو پۆستی (ویلایەت)ی هەرێمەكانی ڕادەست كردوون، لەگەڵ ئەمەداو زۆر بە وریاییو لەسەر هەست هەندێك خەڵكی لە بنەماڵەی خۆی هەڵدەبژاردنو، بە خاتری ئەوە متمانەی تەواوی لەسەر بینو لە توانا ئیداریەكان ڕابیینێت، سەرەتا كاروباری شارە بچووكەكانی وێنەی (طائف)ی پێ دەسپاردن،[٥] بۆ نموونە: ئەگەر هەر یەكێك لە ئەمانە توانای ئیداری خۆی لە میانەی ئیدارەكردنی (طائف)ەوە دەرخستبایە، (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) ئیدارەكردنی (مەككە)شی بۆ بەسەرەوە دەخست، پاشان ئیدارەكردنی (مەدینە)شی بۆ زیاد دەكرد، لەم دەمەدا دەوترا: ئێستا پێگەیشتووە.[٦] ڕاستیەكی بەڵگە

---

١ البلاذري، انساب الاشراف، نقلا عن خلافة معاوية للعقيلي (ص: ٧٣).

٢ خلافة معاوية (ص: ٧٣)، نقلا عن انساب الاشراف (١٦٠/٤).

٣ خلافة معاوية (ص: ٧٤).

٤ الامويون والبيزنطيون، ابراهيم العدوي (ص: ٧٤).

٥ خلافة معاوية للعقيلي (ص: ٧٤).

٦ خلافة معاوية (ص: ٧٥).

نەویستە کە (طائف) لەو سەردەمەدا بە حوکمی چڕبوونەوەی هۆزی (ثقیف) تیایدا شارێکی گرنگ،[١] هەر والیەك بیتوانیایە لە بواری (سیاسیو ئابوری)یەوە دەسەڵات بەسەر ئەوێدا بکێشێت، ئەوا دوای ئەوە زۆر بە ئاسانی دەیتوانی دەسەڵاتی خۆی بەسەر شارەکانی تردا بکێشێت، (نجدة خماش) ئاماژە دەدات کە (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) شارەکانی (حیجاز)ی کردبوونە قوتابخانەیەكو لە میانەی ئیدارەکردنی ئەم وڵاتەوە مەشقی پێ دەکردنو، هەنگاو بە هەنگاو بە پێی نەخشەیەکی داڕێژراو دوای دەرچوونیان لەم ڕاهێنانەیاندا بەرەو ئاستی سەرەوەی دەبردنو ڕێی پێ دەدان پۆستی باڵاتری نێو دەوڵەت وەربگرن،[٢] ئەمەو (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) بە شێوازێکی دەگمەن هەڵوێستی لە بەرانبەر ئەو خزمە نزیکانەی دەنواند کە بۆ هەڵسوڕاندنی کاروباری حوکومەتەکەی پشتی پێ دەبەستن، بە مەبەستی بەرگرتن بە دروستبونی هەر هاوپەیمانیەکی ئەوان لە دژی، هەوڵی دەدا بە پۆستەکانیانەوە سەرگەرمیان بکاتو لێکیان هەڵاوێرێت.[٣] موسڵمانە ناعەرەبەکان لە سەردەمی (معاویە)دا بەوپەڕی نەرمونیانیو سینەفراوانیەوە ڕەفتاریان لەگەڵ ئەنجام دەدراو، زۆر بە سێنایی بە مافە گشتیو تایبەتیەکانی خۆیان دەگەیشتنو، لە تەواوی پۆستە حوکومیەکاندا کاریان دەکرد، (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) لە (شامو مصرو مغرب)دا سیستەمە ئیداریەکانی (بێزەنتیو قیبطی) بە دەستلێنەدراوی هێشتنەوەو، لە وڵاتی (عێراقو خۆراسان)یشدا سیستەمی (فارسی) هێشتەوە، ئەمە لەبەر ئەوە بوو کە لە سەرەتای حوکومەتی (ئومەوی)یدا کەسانێکی دەست نەدەکەوتن لەو زمانانە بزانن کە سیستەمی ئیداری وڵاتە فەتحکراوەکانیان پێ نوسرابوونەوە، سەرەڕای ئەمە پزیشکی تایبەتی معاویە –ڕەزای خوای لێ بێت– (إبن آثال)[٤]ی پێ دەوترا ناموسڵمان بوو، (سرجون کوڕی منصوری ڕۆمی)یش ڕاوێژکاری دارایی معاویە بوو،[٥] (إبن مینا)[٦] و (إبن النضر)[٧]ی خزمەتکاریشی لە ڕیزی ئەو کارمەندانەی بوون کە بەسەر زەویە کشتوکاڵیە

---

١ المصدر نفسه (ص: ٧٥).

٢ الادارة في العصر الاموي (ص: ١٠٨ـ١٠٩).

٣ انساب الاشراف (٤/٦٥، ٦٧)، خلافة معاوية (ص: ٥٤).

٤ تأريخ اليعقوبي (٢/٢٢٣).

٥ تأريخ الخليفة (ص: ٢٢٨).

٦ تأريخ اليعقوبي (٢/٢٩٧)، المحن لأبي العرب (ص: ١٧١).

٧ أنساب الاشراف (٤/١٢٣).

حوکومیەکان (الصوافی)یەوە دایانابوون، ئەمانە هەموویان بە ڕەگەز ناموسڵمان بونو پاشان هەندێکیان هاتنە سەر ئایینی ئیسلام، وێڕای ئەمە (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) ئازادیەکی تەواوی دابوو بە ڕەعێتە ناموسڵمانەکانیو، ئەوانیش بە کەیفی خۆیان دروشمو تقوسە دینیەکانی خۆیانیان پیادە دەکرد، وەڵامی نەصرانیەکانی (دیمەشق) بە ئەرێ دایەوەو هیچی تر مزگەوتی دیمەشقی لەسەر حیسابی کەنیسە (یوحەنا) زیاد نەکرد،[١] هەروەها کەنیسە (ڕەهات ئودیسا)شی بۆ نۆژەن کردنەوە، کە بە هۆی بوومەلەرزەوە ڕووخابوو،[٢] لە سەردەمی ویلایەتی (موسلیمەی کوڕی موخلەدی ئەنصاری) بەسەر (مصر)ەوە (٤٧ـ٦٨ی کۆچی)، یەکەم کەنیسە لە گەڕەکی ڕۆمیەکانی شاری (فسطاط) دروست کرا،[٣] هەروەها (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) بۆ دروستکردنی کۆشکی سەوز (قصر الخضراء)ی شاری (دیمەشق) کە مەڵبەندی ئیمارەکەیو پاشانیش خیلافەتەکەی بوو پشتی بە ژمارەیەك ئەندازیارو پیشەوەری ناموسڵمان بەست، (البلاذري) دەگێڕێتەوە: کۆشکەکە لە پێشدا بە خشتەو قوڕ دروست کرابوو، پاشان ئەم ئەندازیارو پیشەوەرانە تێکیان داو بە بەرد بۆیان نۆژەن کردەوە.[٤]

ئیتر دەبینین سیاسەتی سەماحەتو سینە فراوانی لە بەرانبەر ڕەعێتە ناموسڵمانەکەدا سروشتێکی جیاوازو دەگمەنی سەردەمی خیلافەتی (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت)، بە هەمان چەشن، ڕەچاوکردنی سیاسەتی سۆزو زیاد بایەخدانو، نواندنی هەڵوێستی جوان لە بەرانبەر خەڵکانی ناعەرەبو خزمەتکاردا یەکێکی تر بوو لەو سیفەتە شکۆدارانەی سەردەمی معاویەی پێ لە سەردەمەکانی تر جوودا دەکرێتەوەو دەناسرێتەوە، دەبینین (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) بۆ بەڕێوەبردنی هەندێك لە کاروبارە ئیداریەکانی پشتی بە خزمەتکارەکان بەستووە، لە سەردەمی ویلایەتی (موغیرەی کوڕی شوعبە) (عبدالله ی کوڕی دراج)ی خزمەتکاری خۆی کردە بەرپرسیاری خەراجی شاری (کوفە)[٥]، لە دەمی ویلایەتی (عوتبەی کوڕی ئەبی سوفیان)یشدا (وردان)ی خزمەتکاری خۆی کردە بەرپرسیاری

---

١ خلافة معاوية للعقيلي (ص: ٨٠).

٢ الامويون والبيزنطيون (ص: ٢٩١).

٣ فتوح مصر (ص: ١٣٢)، غير المسلمين في المجتمع الاسلامي للقرضاوي (ص: ٢٠، ٢١).

٤ أنساب الاشراف (١٤٧/٤).

٥ خلافة معاوية للعقيلي (ص: ٨١).

(خەڕاج)ی (مصر)،[1] (موختار) یەکێك بوو لە ڕیزی خزمەتکارەکانو سەرۆکی پاسەوانەکانی بوو، دەوترێت یەکێکی تر بووەو بە ناوی (مالك)، ئەمەو (أبا المخارق) خزمەتکارێکی سەر بە هۆزی (حمیر) بوو دەرگاوانی بوو، (سعد)ی[2] خزمەتکاریشی کاروباری دارایی ولاتی (حیجاز)ی بۆ بەڕێوە دەبرد، (معاویە) سەبارەت بە (سعد) وتبووی: (سعد)ی خزمەتکارم خۆشگوزەرانترین کەسە، بە هارە هەواری (جدە)یە، هاوینەهەواری (طائف)ە، زستانە هەواری (مەککە)یە.[3] (زیادی کوڕی ئەبی سوفیان)یش، (مهران)ی خزمەتکاری خۆی کردە دەرگاوانو کاتیبی خەراجی عێراق.[4]

(مسلمەی کوڕی مخلدی أنصاری)یش لە ساڵی (٥٥ی کۆچیدا) پۆستی ئیدارەی کاروباری هەرێمی (مغرب)ی خستە بەردەست (دینار= أبو المهاجر)ی خزمەتکاری تایبەتی خۆی،[5] لەگەڵ هەبوونی ئەم بەڵگانەشدا (عباس محمود العقاد) ئاماژە بەوە دەدا کە (معاویە) ئاوڕی بۆ لای خزمەتکارەکان نەدەدایەوەو، هەموو ئەو توانجو تەشەرانەی دووبارەکردونەتەوە کە لە لایەن بەناو ڕۆژهەڵاتناسەکانەوە ئاراستەی (معاویە) کراونو بە کەسێکی دوور لە سینەفراوانو سەماحەتیان وەصف کردووە، ئەمە لە کاتێکدا سەرچاوە کۆنو ڕەسەنە عەرەبیەکان سەبارەت بە سینەفراوانی (معاویە)و کرانەوەی سەردەمەکەی بەم جۆرە نموونانە پڕن،[6] لە لایەکی ترەوە (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) کاربەڕێوەبەری هەرێمەکانی سەربەست کردن لەوەدا هەریەکەیان لە بەرانبەر هەرێمی ژێردەستیدا بەرپرسیارەو پێویستە لەسەری چاکسازیە پێویستیەکانی بۆ ئەنجام بدات.[7]

ئیدارەی دەوڵەتەکەی بەم جۆرە دابەش کردبوو: (دیمەشق) پایتەختی دەوڵەتە، وڵات بۆ چەند ویلایەت دابەش کراوە، هەر ویلایەتێك لە لایەن والیەکی سەر بە خەلیفەوە بەڕێوە دەبرێت، هەریەکێك لەم والیانە دەسەڵاتێکی تەواوو بێ سنووری بۆ ئەم بەڕێوەبردنە

---

١ الادارة في العصر الاموي، خماش (ص: ٣٤٧).
٢ أنساب الاشراف (٥٤/٤، ٦٣)، خلافة معاوية (ص: ٨٢).
٣ معجم البلدان (١٢/٤)، خلافة معاوية للعقيلي (ص: ٨٢).
٤ تأريخ الخليفة (ص: ٢١٢).
٥ خلافة معاوية للعقيلي (ص: ٨٢).
٦ خلافة معاوية (ص: ٨٢).
٧ خلافة معاوية (ص: ٨٣).

پێدراوە، لە هەندێ کاتدا دەوڵەت والی ڕادەسپارد بە ویستو ئیرادەی خۆی کاروبارەکان ڕایی بکات، تا کار بەوە گەیشتبوو هەندێکیان دەسەڵاتی (کوشتنو دوورخستنەوەو بەندکردنو دەربەدەرکردن)یشی بەکاردەهێنا، تەماشامان کردووە کە ئەم جۆرە حوکمە ڕەهایە دووبارە نەبۆتەوە، بەڵکو هەمیشە لە ویلایەتی عێراقداو بە حوکمی سەرهەڵدانی فیتنەو ئاژاوەیەك کە تێیدا هەبووە کورت هەڵاتوە، (خەلیفە) والی دەستڕۆیشتوو بەهێزو توانـاو بە جەرگو بەناوبانگی بۆ ئەم ویلایەتە دیاری دەکردن، ئەمەو (زیاد بن أبیە) بەناوبانگترین والی معاویە بوو لە عێراقدا، بەڵام تەواوی ویلایەتەکانی تر بە گوێرەی سروشتی خۆیان حوکمیان بەسەردا دەکراو دەبووایە والی پابەندی فەرمانو بڕیارەکانی (خەلیفە) بووایەو بەبێ ڕاوێژی ئەو هیچ کارێکی ڕایی نەدەکردو هیچ حوکمێکی دەرنەدەکردن، دەبووایە سەبارەت بە هەرچ شتێك پەیوەندی بە بەرژەوەندی گشتیەوە بوایە بۆ لای خەلیفە گەڕابایەوەو پرسی پێکردبایە، بەڵام ئەگەر کارەکە تایبەت بوایە بە ویلایەتەکەی خۆیەوە، ئەوا بۆی هەبوو بە چ شێوازێك ئامانجی بۆ دەپێکرێتو بەرژەوەندیە گشتیەکەی بۆ دێتەدی بە ڕای خۆی ڕەفتار بکاتو پاشانیش سەبارەت بە هەموو هەڵسوکەوتەکانی لە بەرانبەر خەلیفەدا بەرپرسیارەو لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکرێت، هەندێك لە ویلایەتەکانی دەوڵەتە گەورەکەی سەردەمی معاویە[1] بریتی بوون لە: (دیمەشق)ی پایتەخت، (بصرە)، (کوفە)، (مکەو مەدینە)، (مصر)و چەند ویلایەتێکی تریش، بەڵام سەبارەت بە والیەکانی ئەوا بە ئیزنی خودا لەمەولاو میانەی خستنەڕووی باسی هەر هەرێمێك قسەیان لەسەر دەکەین:

## یەکەم: (بصرە): والیە هەرە بەناوبانگەکانی لە سەردەمی (معاویە)دا ئەمانە بوون:

١ـ بسری کوڕی ئەرتەئە (ڕەزای خوای لێ بێت): ساڵی ٤١ی کۆچی پۆستی ویلایەتی ئەو هەرێمەی وەرگرت، چەند ڕیوایەتێك کە پلەی (صحت)یان وەرنەگرتوە ئاماژە دەدەن کە (بوسر) لەگەڵ دوو کوڕەکانی (زیاد بن أبیە) ڕووبەڕوو بۆتەوەو کێشەی بۆ دروست کراوە،[2] ئینجا لێخراوەو (عبدالله ی کوڕی عامر)ی لە جێگە دانراوە.

---

١ الدولة الاموية (٩٧/١)، محمد سيد الوكيل.

٢ تأريخ الطبري (٨٢/٦).

٢ـ (عبدالله ی کوڕی عامر) (ڕەزای خوای لێ بێت) ـ ٤١ـ٤٤ ـ:

لە ساڵی ٤١ی کۆچیدا معاویە (ڕەزای خوای لێ بێت) عبدالله ی کوڕی عامری کردە والی (بصره)و سەرپەرشتیاری فەتحی (سوجستان)[١] و (خۆراسان)[٢]. هیچ ڕیوایەتێکی صحیح لەسەر ئەوە نەهاتووە کە (معاویە) لەبەر هۆکارو غەرەزی شەخسی (عبدالله)ی کردبێتە (والی)ی (بصره)، بەڵکو هۆیەکەی ئەوەبوو (عبدالله) لە سەردەمی (عوسمان) (ڕەزای خوای لێ بێت)داو لە میانەی وەرگرتنی پۆستی ویلایەتی (بصره)و جەنگی (سوجستان‌و خۆراسان)دا ئەزمون داربوو و شارەزایی چاکی لەم بوارەدا پەیدا کردبوو، پێویستیش بوو لەسەر معاویە کاروبار بخاتە بەر دەستی خاوەنی خۆی‌و نان بە نانەواو گۆشت بە قەساب بسپێرێت‌و پیاوی گونجاو لە شوێنی گونجاودا دانێ.[٣]

پاش تێپەڕینی سێ ساڵ بەسەر ویلایەتەکەیداو فەتح کرانی سوجستان‌و خۆراسان، موسڵمانان سودێکی زۆریان لە ئەزمون‌و شارەزاییە سەربازیەکەی وەرگرت‌و، ئینجا پێویستی وای خواست بگۆڕدرێت، ئەمەو معاویە لێی خست‌و لە سەرەتای ساڵی ٤٥ی کۆچیدا (حارثی کوڕی عبداللەی ئەزدی) لە جێ دانا، دوای تێپەڕینی چوار مانگ (حارث)یشی لێخست‌و (زیاد بن أبیه)ی کردە والی (بصره).[٤]

٣ـ (زیاد بن أبیه) ٤٥ـ٥٣ك:

أـ پشت‌و ڕەچەڵەکی: یەکێك لە کێشە هەرە ئاڵۆزەکانی زیاد (ابو المغیره) بریتی بوو لە سەرلێشێوانی سەبارەت بە بنەچەکەی خۆی، دایکی کەنیزەکێك بوو بە ناوی (سومەییە)،[٥] (مێژوونووسان) لەسەر ئەوە کە باوکی کێیە یەکدەنگ نین، ئیدی سەبارەت بە بنەچەکەی ئەو ڕای جیاوازیان هەیە، ئەمەو لە سەرچاوەکاندا هەرجارەو لە هەر شوێنێکدا بە جۆرێك ناوی دەهێنرێت، جارێك بە (زیادی کوڕی سمیة)[٦] و جارێکی تر بە (زیادی کوڕی عبید)[٧] و

---

١ سوجستان: دەکەوێتە باشووری خۆرئاوای ئەفغانستان.

٢ خۆراسان: دەکەوێتەباکووری خۆرهەڵاتی ئێران‌و باکوری خۆرئاوای ئەفغانستان.

٣ مرویات خلافة معاویة في تأریخ الطبري (ص: ٢٣٤).

٤ تأریخ الطبري (١٣٣/٦).

٥ (زیاد بن أبیه) و دوره في الحیاة العامة، للرضوانیة (ص: ٣١).

٦ تأریخ الطبري (١٣١/٦).

٧ العواصم من القواصم (٣١).

جارێکی دی بە (زیادی ئەمیر)و[١] لە شوێنێکی تر بە (زیادی کوڕی ئەبو سوفیان)و[٢] زۆر جاریش بە (زیاد بن أبیه)[٣] ناوی دەهێنرێت، هەموو ئەمە بە خاتری ئەوەیە کە گومان لەسەر دەستنیشانکردنی باوکی هەیە.[٤]

ب- ڕێکەوتنی (زیاد) لەگەڵ (معاویە): (زیاد بن أبیه) لە حوکومەتەکەی (علی کوڕی أبی طالب)ی ئەمیری ئیمانداراندا والی خۆراسان دەبێتو دەرهەق بە (عەلی) ئەوپەڕی دڵسۆز دەبێت، هێشتا (عەلی) (ڕەزای خوای لێ بێت) لە ژیاندا بوو، (معاویە) هەوڵو تەقالایەکی زۆریدا تا (زیاد) لە (عەلی) بکاتو بەڵام هیچ کامێك لەو هەوڵانە سەریان نەگرتو بە هەوادا چوون، دوابەدوای کوژرانی (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران، (معاویە) هەلێکی زێڕینو باشی دەستکەوت تا چاو بە ئەو هەوڵانەیدا بخشێنێتەوە کە بە مەبەستی ڕاکێشانی (زیاد) داونیو ویستی ئەمجارەیان بە کەمترین تێچوون ئەم کارە ئەنجام بدات، سەرەتا (معاویە) زمانی هەڕەشەو موژدەی لە بەرانبەردا بەکارهێنا، (زیاد)یش لە وڵاتی (فارس)دا خۆی لە قەڵایەکدا مەڵاسدا (کە بە ناوی خۆیەوە ناسرابوو)، بە حوکمی ئەوە (معاویە) لە هەموو کەس زیاتر بە توندوتیژیو وشكو ڕەقی (زیاد) ئاشنابوو، لێی ترسا، بێگومان خۆ قایمکردنی (زیاد) لە (فارس) کە لە کاتێکدا دەیزانی تەنها ئەو ماوە کە بە حوکمی (معاویە) قایل نەبووەو نەچۆتە نێو ئەو بازنەوە کە خەڵك چۆتە نێویەوە، دەبێتە بەڵگە کە بە پلەی یەکەم متمانەی تەواوی لەسەر خۆیو بە پلەی دووەمیش متمانەی بە توانا مرۆییو ئابووریەکانی هەرێمی فارس هەبوو، بەڵام لەو حاڵەدا ئەگەر پێویست بوو هێز بەکاربهێنرێت ئەوا ئەمانە بە تەنها بەشی ئەوەی ناکەن پێیان ڕووبەڕووی (معاویە) بێتەوە: ئەمە وای لە (زیاد) کرد کە ئەم قۆناغە تێپەڕێنێت و هەوڵیستە بەرهەڵستکاریەکەی لە بەرانبەر (معاویە)دا بۆ هەڵوێستێکی ئیجابی تر بگۆڕێت ئەمە لە لایەك ،لە لایەکی ترەوە پاش صوڵحەکەی لەگەڵ (حەسەن)دا، (معاویە) هەوڵیدا پەیوەندی بە (زیاد)ەوە بکاتو، ڕێی بە (موغیرەی کوڕی شوعبە)دا خۆ لەم مەسەلەیە هەڵقورتێنێتو چارەسەری بکات، ئەمەو (موغیرە) توانی قنیات بە (زیاد) بکاتو بەیعەت بە (معاویە) بداتو بێتە ژێر فەرمانیەوە، ئەم سەرکەوتنەی (موغیرە) یەکێکە لەو خزمەتە هەرە گەورانەی ئەو کە پێشکەشی (معاویە)ی کردوون، (معاویە) دوای

---

١ الطبقات (٧/٩٩)، (زیاد بن أبیه) و دوره في الحیاة العامة (ص: ٣١).

٢ طبقات خلیفة بم خیاط (ص: ١٩١).

٣ (زیاد بن أبیه) و دوره في الحیاة العامة (ص: ٣٢).

٤ المصدر نفسه (ص: ٣٢)، الوافي بالوفیات (١٥/٣٢).

ئەنجامـدانی جـەنگێکی تونـدی دەسـتەویەخە نەبوایـە ئەسـتەم بـوو دەسـتی بـە (زیـاد) گەیشتبایەو گەردنی پێ کەچ کردبایە، ئەمە لە کاتێکدا کەس نەیدەزانی کێ لە هەڵوێستێکی ئاوا سامناکدا براوە دەبێت.[1]

بەڵێ (معاویە) لەم کارەدا پەلەی نەکردو خۆی لـە بـەکارهێنانی هێـز دوورەپـەرێز کـردو، هەلی لە کات وەرگرت‌و پشتی بە کەڵەمێردێکی زۆرزانی عەرەب بەسـت تـا قنیـات بـە (زیـاد) بکـات‌و ئـیتر بـەم دانـایی‌و زاناییـەی هـەیبوو تـوانی بزوتنـەوە بەهێزەکـەی (زیـاد) لـە قـەڵا سەختەکەی فارس بینێتەوە نێو ئامێزی فەرمانڕەوایەتیەکەی خۆی (ڕەزای خوای لێ بێت).[2]

ج- (معاویە)و بابەتی لکاندنی ڕەچەڵەکی (زیاد):

(الطبري) دەڵێت: وتراوە لە ساڵی ٤٤ کۆچیدا معاویە چەکەی (زیادی کـوڕی سـومەییە)ی بە پشتی (أبو سوفیان)ی باوکیەوە لکانـد،[3] (طـبري) دەڵێـت: .... دەڵـێن کاتێـك (زیـاد) بـە میوانی هاتە لای (معاویە) پیاوێکی لە هۆزی (عبدالقیس)ی لەگـەڵ دەبێـت، کـابرا بـە (زیـاد) دەڵێت: من لە لای (إبن عامر) دەستم دەڕوات، ئەگەر مۆڵەتم بدەی دەچمە لای، (زیاد) وتـی: بەو مەرجە چ گفتوگۆیەك لە نێوانتاندا ئەنجام درا بۆم بگێڕیەوە، وتـی: بـەڵێ، باشـە، ئـەمجا ڕێی پێداو ئەویش چـووە لای، (إبـن عـامر) پێـی وت: هـەی هـەی! ! کـوڕی (سـومەییە) وای لێهاتووە: پەرێزەکانم پیس دەکات‌و بە گژ کارمەندەکانمدا دەچێت، عـەزمم جـەزم کـرد بـچم چـەند کەسـێك لـە هـۆزی (قـوڕەیش) بهێـنم‌و سـوێند بخـۆن کـە: هـەرگیز (أبـو سـفیان) (سومەییە)ی نەدیتووە.[4] وتی: کاتێك کابرا بۆ لای (زیاد) گەڕایەوە، ئامـادە نـەبوو قـسەکانی بۆ بگێڕێتەوە، بەڵام (زیاد) وازی لێ نەهێنا تا قسەکانی پێ گێڕانەوە، (زیـاد)یـش چـووە لای (معاویە)و وتەکانی (ابن عامر)ی پێ ڕاگەیاند، (معاویـە) بـە دەرگاوانەکـەی وت: ئەگـەر (إبـن عامر) هات بە دەموچاوی وڵاخەکەی ڕاکێـشەو بیگێـڕەوە، کـە هـات وای لـێ کـرد، جـا (إبـن عامر) چووە لای (یەزید)و سکاڵای ئەمەی لەلا کـرد، (یەزیـد) پێـی وت: ئایـا باسـی (زیـاد)ت نەکردووە؟ وتی: بـەڵێ. (یەزیـد) لەگـەڵی سـوار بـوو و هێنایـە ژوورەوە، کـە (معاویـە) (إبـن عامر)ی بینی هەستاو چـووە ماڵـەوە، (یەزیـد) بـە (إبـن عـامر)ی وت: دانیـشە، زۆر لـە مـاڵ

---

١ (زياد بن أبيه) و دوره في الحياة العامة (ص: ٧٥-٨١).
٢ مرويات خلافة معاوية (ص: ١٧٣)، تأريخ الطبري (٦/٩٤، ٩٥).
٣ تأريخ الطبري (٦/١٣١).
٤ تأريخ الطبري (٦/١٣١).

نامێنێتەوە، زۆری خایاند، ئەمجا (معاویە) لە ماڵ هاتەوەو شوڕکە دارێکی بە دەستەوە بوو و پێی لە دەرگایەکان دەداو، ئەم شیعرەی دەخوێندەوە:

لنا سیاق ولکم سیاق          قد علمت ذلکم الرفاق[1]

ئینجا دانیشتو وتی: ئەی (إبن عامر) تۆ ئەم قسانەت سەبارەت بە (زیاد) کردوون، بەڵام سوێند بە خودا هەموو عەرەب دەزانن کە من لە سەردەمی جاهیلیدا بە دەسەڵاتترین کەس بووم، (ئیسلام)یش دەسەڵاتی بۆ زیاتر کردووم، من لەبەر کەمی کەسوکار (زیاد)م بۆ خۆم زیاد نەکردووە، لەبەر دەستەپاچە بوون خۆم پێی بەهێزو دەسەڵات نەکردووە، بەڵام زانیم کە ئەو هەقێکی هەیەو منیش بۆم لە جێی خۆی دانایەوە،[2] کاتێك (معاویە) تۆرەمەی (زیاد)ی گەیاندەوە پشتی باوکی، تۆمەتبارو تاوانبار کراو وترا: کە پێچەوانەی حوکمەکانی (ئیسلام) ڕەفتاری کردووە، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((لا دعوة في الاسلام ذهب أمر الجاهلية، الولد للفراش، وللعاهر الحجر))[3] واتە: لکاندنەوە لە ئیسلامدا نیە، کولتوری جاهیلی ڕۆیشتو باوی نەما، بەچکە هی ئەو کەسەیە کە سەرجێیی (شەرعی) دەکات، بەشی زیناکەر ڕەنجەڕۆییو بەردوچکەیە، (دکتۆر خالد الغیث) لە کتێبی (مرويات خلافة معاوية)دا بەم شێوەیە بەرپەرچی ئەم (تۆمەتبارکردنو تاوانبارکردنە)ی معاویە دەداتەوە: ... بەڵام سەبارەت بە تۆمەتبارکردنی (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) دەرهەق بە لکاندنی چەکەی (زیاد) بە پشتی باوکیەوە، ئەوا من ڕیوایەتێکی صەحیحو ڕاشکاوم دەست نەکەوتووە کە جەخت لەسەر ئەوە بکاتەوە (معاویە) کارێکی لەم جۆرەی ئەنجام دابێت، وێڕای ئەمە کە خودی پلەی هاوەڵایەتی ئەو (ڕەزای خوای لێ بێت)و دادپەروەریو دینو شەرعزانیەکەی ڕێگرن لەبەر دەم ئەودا بڕیاری پێغەمبەری خودا ڕەدکاتەوە، ئەمە لە کاتێکدا کە (معاویە) یەکێکە لە (ڕاوی)یانی فەرموودەی: ((الولد للفراش، وللعاهر الحجر))[4]، بەڵکو تۆمەتبارکردنەکە دەبێ ڕووی پێ لە (زیاد بن أبيه) بکرێت، چونکە ئەو بۆ خۆی چەکەی خۆی پاڵداوەتە لای (أبو سوفیان)، ئەمە بە پێی ڕیوایەتێك کە (مسلم) لە

١ تأريخ الطبري (٦/١٣٢).
٢ تأريخ الطبري (٦/١٣٢).
٣ صحيح سنن أبي داود (٢/٤٣٠).
٤ فتح الباري (١٢/٣٩).

صەحیحەکەی خۆیداو لە ڕێی (أبو عثمان)[1]ەوە دەیهێنێت‌و دەڵێت: (أبو عثمان) وتی: کاتێك زیاد خۆی پاڵدا-یە لای أبو سفیان- بە (أبو بکرة)-ی برای- گەیشتم‌و پێم وت: ئەم بەزمە چیە دروستتان کردووە؟ من لە (سعدی کوڕی ئەبی وەقاص)م بیست، دەیوت: بەم دوو گوێچکانەم لە پێغەمبەری خودا (ﷺ)م بیست، کە دەیفەرموو: ((من إدعی أبا في الإسلام غیر أبیه، یعلم أنه غیر أبیه، فالجنة علیه حرام)) واتە: هەر کەسێك لە ئیسلامدا خۆی پاڵداتە کەسێکی غەیری باوکی‌و بشزانێت کە ئەوە باوکی نیە، ئەوا بەهەشتی لەسەر حەرامە، جا (أبو بکرة) وتی: هەروەها منیش ئەم فەرموودەیەم لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بیستووە،[2] (النووي) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بەم جۆرە قسە لەسەر ئەم هەواڵە دەکات:... واتای قسەکە: ڕەخنەو ناڕەزایی دەگەیەنێت لە بەرانبەر (أبو بکرة)دا، چونکە ئەم (زیاد)ەی باسمان کردو بە (زیادی کوڕی أبی سفیان) ناسراوەو پێشی دەوترێت: (زیاد بن أبیه)و (زیاد بن أمه) ئەوا دایکبرای (أبو بکرة)یە،... لەبەر ئەمە (أبو عثمان) بە (أبو بکرة)ی وت: ئەم (بەزمە)ی دروستتان کردووە چیە؟ (أبو بکرة) (ڕەزای خوای لێ بێت) یەکێك بوو لەو کەسانەی ئەمەی پێ ناخۆش بوو، بە خاتری ئەوە دەنگی لە زیاد وەرگرت‌و سوێندی خوارد تاهەتایە قسەی لەگەڵ نەکات، پێ دەچێ کاتێك (أبو عثمان) ئەم قسەی بە (أبو بکرة) وتبێت کە نەیزانیوە (أبو بکرة)ش ناڕازییە، یان لەوانەیە مەبەست لە ئەم قسەیەی: (ئەمە چیە دروستتان کردوە)؟ ئەمە بێت: ئای ئەوەی برایەکەت کردویەتی چەند قێزەونەو سزایەکەی چەندە سەختە؟ نابینی پێغەمبەری خودا (ﷺ) چۆن بەم فەرموودەیەی حەرامبوونی بەهەشت لە بەرانبەر بکەری ئەم کردارە ڕادەگەیەنێت!.[3]

بەم شێوەیە دەردەکەوێت کە لکێنەر خودی (زیاد)ە، لە ڕاستیدا مەسەلەی لکاندنی چەکەی (زیاد) ئەگەر لە لایەن (معاویە)شەوە ئەنجام درابێت، ئەوە بابەتێکی ئیجتیهادیەو بە ڕای زۆرێك لە مێژوونووسان: بەڵگەگەلێك دەیسەلمێنن: کە (إبوسفیان) لەگەڵ (سمیە)ی کەنیزەکی (حارثی کوڕی کلدة الثقفي) جوت بووە، لە سەردەمی جاهیلیدا (سمیە) زیناکەرو سۆزانی بووەو خاوەنی ئاڵا بووەو ئیدی (زیاد)ی بە (أبو سفیان)ەوە بەستۆتەوە، هەروەها وتوویانە: کە کاتێك لە سەردەمی (عومەری کوڕی خەطاب)دا (أبو سفیان) پیر بوو و

---

١ (أبو عثمان النهدي)، هەر بەم نازناوەیەوە ناسراوە، لە ڕیزی تابیعیە گەورەکانە، ساڵی (٩٥)ی کۆچی کۆچی دوایی کردووە.

٢ صحیح مسلم بشرح النووي (٢/٥١، ٥٢).

٣ شرح صحیح مسلم (٢/٥٢، ٥٣).

(زیاد)یش پێگەیشت، (أبو سفیان) لەبەردەم (عومەری کوڕی خەطاب) (ڕەزای خوای لێ بێت)دا دانی بە ئەمەدا هێناوە.[1]

(إبن تیمیة)ش دەڵێت: (أبو سفیان) دەیوت: کە (زیاد) لە ئاوی ئەوە.[2] کاتێکیش سەرە گەیشتە سەر (خیلافەتی معاویە) (أبو مریم السلولی)–ی هاوەڵی– شایەدی بۆ (زیاد) دا کە لە (أبو سفیان)ە، لە سەردەمی جاهیلیدا (أبو مریم) لە شاری (طائف) مەیفرۆش دەبێتو، بە دەلاڵی ئەو (أبو سفیان)و (سمیّة) پێکگەیشتوون، کە دابو نەریتێکی ئاسایی ئەو سەردەمە بووە،[3] وەکو دیارە دەنگۆی ئەمە بلاوبۆوەو، بەر لەوە (معاویە) (زیاد) بکات بە کوڕی باوکی، کابرایەکی (بصرە)یی شایەدی ئەمەی بۆ زیاد دابوو،[4] کەواتە بابەتی پاڵدانی زیاد بۆ لای (أبو سفیان) شتێکی دێرین بوو، نە کەم نە زۆر پەیوەندی بە ئەوەوە نەبووە کە هەندێك ڕیوایەتکەرو چیرۆك هەڵبەست دەڵێن: گوایە لە ئەنجامی ڕاوێژی (معاویە) بە (مغیرەی کوڕی شوعبە)وە دروستکراوەو کراوەتە چەکەیەکی مامەڵەو ڕێکەوتنەکەی نێوان (معاویە)و (زیاد)ی پێ پێکهێنراوە، یان چەندین قسەی لەم جۆرە کە لە لایەن چیرۆك هەڵبەستەکانەوە داهێنراون،[5] ئەمەو دوای تێپەڕینی چەند دەیەیەك بەسەر ئەمەدا دەبینین پێشەوا (مالك ی کوڕی أنس)ی ئیمامی شاری (مدینە) لە کتێبی (الموطأ)دا ناوی (زیاد) بە (زیادی کوڕی أبی سفیان) دەهێنێتو، چ نانوسێتو نالێت: (زیاد بن أبیە)، کە ئەمە لە سەردەمی (عەباسی)یەکاندا بوو،[6] دەوڵەت هی ئەوان بوو، حوکم بەدەست ئەوان بوو، بە خاتری ئەوە دەیانزانی مەسەلەی (زیاد) شتێکە خەڵك ڕای جیاوازیان لەسەری هەیە، هەیە ڕێگەی پێداوەو، هەیە ڕێگەی پێ نەداوەو دژایەتی کردنی مەسەلەیەکی ئاوا ڕێی تێناچێت، بۆیە بە هیچ شێوەیەك هێرشیان نەکردە سەر (ئیمام مالك)و ڕەخنەشیان لێ نەگرت.[7] لە پاڵدانی (زیاد بۆ لای أبو سفیان) لە لایەن (ئیمام مالك)ەوە، زانیاریەکی جوانو وردەکار بەدی دەکرێت کە هەموو کەس لێی حاڵی نابێت، ئەویش ئەمەیە: کاتێك مەسەلەکە ناچێتەوە جێی

---

١ مروج الذهب (١٤/٣، ١٥)، الدولة الاموية المفترى عليها (ص: ١٩٥).
٢ الفتاوى (١٤٨/٢٠).
٣ الكامل في التأريخ (٤٧٠/٢).
٤ تأريخ الطبري (١٣١/٦، ١٣٢).
٥ الدولة الاموية المفترى عليها (ص: ١٩٦).
٦ المصدر نفسه (ص: ١٩٦).
٧ العواصم من القواصم (ص: ٢٥٤).

خۆی‌و دەبێتە جێی مشتومڕو ناکۆکی‌و پێویست دەکات هەڵسەنگاندنی بۆ بکرێت‌و بە لایەکدا بخرێت ئەوا دادوەری شەرعی حوکمی لەسەر دەدات‌و بە لایەکیدا دەخات‌و کێشەکە کۆتایی پێ دەهێنێت، والله أعلم.[1]

بەڵام سەبارەت بە دژایەتیکرانی دەقی فەرمودەی پیرۆز لە لایەن ئەم جۆرە پاڵدان‌و پێوەلکاندنە: ئەوا کەسانێك هەن پاساویان بۆ معاویە هێناوەتەوەو وتوویانە: معاویە لەبەر هەمەجۆری هاوسەرگیری سەردەمی جاهیلی ئەو کارەی کردوە، جۆرێك لەم هاوسەرگیریانە بەم جۆرە بوو: تاقمە کەسێك لەگەڵ ئافرەتێکی سۆزانی جوت دەبوون، ئەگەر سکی پەیدا بووایەو پاشانیش منداڵی ببووایە ئەوا بە ئارەزووی خۆی دەیووت ئەم سکەم لە فلانە کەس بووەو، ئیدی دەکرایە ڕۆڵەی ئەو پیاوە، کاتێك ئیسلام هات ئەم جۆرە هاوسەرگیریەی حەرام کرد، بەڵام بەبێ جیاوازی دانی بە نەسەب‌و ڕەچەڵەکی هەموو ئەو کەسانەدا هێنا کە زادەی ئەم جۆرە هاوسەرگیریانە بوون‌و بۆی چەسپاندن، جا (معاویە) وای بە زەیندا هات کە ئەم کارەی ئەو دەیکات جایزو ڕێگە پێدراوەو جیاوازی نەخستە نێوان چەسپاندنی بنەچەکەی سەردەمی جاهیلی‌و سەردەمی ئیسلام.[2]

(ئیمام مالك) بە جایزی داناوە یەکێك یەکێکی تر بکاتە برای خۆی‌و بڵێ: ئەوە کوڕی باوکمە، مادام کەس سەبارەت بەم جۆرە ڕەچەڵەکە کێشە دروست نەکات، ئیدی (حارثی کوڕی کلدة) کە (سمیە) کەنیزەکی ئەو بوو کێشەی بۆ (زیاد) دروست نەکرد، زیادیش پاڵ نەدرابووە لای ئەو، بەڵکو تەنها کوڕی کەنیزەکێکی سۆزانی ئەو بوو و لە ماڵی ئەودا لە دایك ببوو، کێ بیوتبایە لە ئاوی منە هی ئەو بوو، مەگەر، کەسێك لە پێشتر بۆ ئەمە بە بەڵگەوە بەرهەڵستی کردبایە، معاویەش لەمبارەوە جێگەی تانەو لۆمە نیە، بەڵکو ئەمە لە مەزەبی (ئیمام مالك)دا ڕەوایە.

جا ئەگەر بوترێت: باشە بۆ هاوەڵان ڕەخنەیان لێگرتووە؟ دەڵێین: چونکە مەسەلەکە ئیجتیهادیە.[3]

ڕووداوەکان دەیچەسپێنن کە معاویە سەبارەت بە ئەمە قەناعەتی بە مافی زیاد هەبووەو بۆی سەلماندووە، ئیتر دەبێت (معاویە) ئەم هەواڵەی لە دەمی باوکیەوە بیستبێت، دەنا

---

١ فصل الخطاب في مواقف الأصحاب (ص: ١٤١) نقلا عن العقاصم (ص: ٢٤٢).

٢ الكامل في التأريخ (٢/٤٧١).

٣ العواصم من القواصم (ص: ٢٥٣).

هێندەی باوەڕ بە کارەکەی خۆی نەدەبوو نەیدەکردە بابەتێکی پێویستو ئاوا بە ناچاری ئیشی لەسەر نەدەکردو نەیدەخستە بواری دانانەوەی شت لە شوێنی خۆی، هەرچەندە ئەمە لە نێو خەڵکدا باو بوو کە (زیاد) لە (أبو سفیان)ە، بەڵام (معاویە) ویستی بە ڕەسمی بیچەسپێنێت.[١]

س ـ وتارە قرتاو–و بێ حەمدو سەنا–کەی (زیاد) لە (بصرە):

کە لە ساڵی ٤٥کۆچیدا (زیاد) کرایە والی (بصرە)، وتارێکی قرتاو (بتراء)ی خوێندەوەو،[٢] سوپاسو ستایشی خودای تێدا نەکرد، وتراوە: بەڵکو سوپاسی خودای تێدا کردووەو وتی: سوپاس بۆ خودا لەسەر خێرو چاکەکانی، لێی دەپاڕێینەوە زیاترمان پێ ببەخشێت، خودایە چۆن نازو نیعمەتت پێ بەخشیوین، سوپاسو پێزانین لە ڕاست ئەو نازو نیعمەتانە بخەرە دڵو مێشکمانەوە، ئەمجا بزانن کە: نەفامی کەودەنیە، گومڕایی سەرکوێریە، تاوانو بەدڕەوشتی هەڵگەری ئاگرە بۆ خاوەنەکانیو، تاهەتایە پێی دەسوتێن، ئەو تاوانە گەورانەی گێلو نەفامەکانتان ئەنجامی دەدەنو ئاقڵمەندەکانیشتان تێیانەوە گلاون، منداڵ لە ڕاستیاندا موی بەدەنی پێی دێتەدەرو پیر دەبێت، بەڵام گەورە موچوڕکی بە بەدەنیدا نایەو حاشایان لێ ناکات، هەروەکو گوێتان لە ئایەتەکانی خودا نەبووبێتو کتێبی خوداتان نەخوێندبێتەوەو، هەموو ئەو موژدانەتان نەبیستبن کە خودا چ پاداشتێکی بە نرخی بۆ گوێڕایەڵو فەرمانبەردارانی ئامادەکردووەو، هەموو ئەو هەڕەشانەشتان نەبیستبن کە خودا چ سزایەکی بە ئێشو ئازاری بۆ یاخیو سەرپێچیکارانی ئامادە کردووە، لە زەمەنێکدا کە هەمیشەیەو کۆتایی نایەت، ئایا بڕیارتان داوە وەکو ئەو کەسە بن کە دونیا چاوەکانی ئەبلەقو کوێر کردوونو گوێچکەکانیشی بە ئارەزووەکان پڕو کەڕ بووبنو داخرابنو، دونیای فانیو بڕاوەی بەسەر قیامەتی باقیو نەبڕاوەدا هەڵبژاردبێت؟!.

ئەوە بۆ بیر ناکەنەوە کە چ کارەساتو خراپەیەکی واتان لە ئیسلامدا داهێناوە، کە بەر لە ئێوە کەس ئەمەی نەکردووە؟!، دەزانن چتان کردووە؟ خۆتان لەو کۆڕو کۆبوونەوە قێزەوونو پەستانە بێخەبەرکردووە کە جرتو چەقەنەیان تێدا دەکرێتو مەیان تێدا دەخورێتەوە، خۆ ژمارەیان کەمیش نیە، ئەوە کەسانێکتان تێدا نیە ئەو سەرپێچیکارو یاخیانە قەدەغە بکەن لە گەڕانو سوڕانی شەوانەو هۆسەنانەوەی ڕۆژانە، ئیتر خرم خزمێنە

١ ادارة العراق في صدر الاسلام، رمزية عبدالوهاب (ص: ٦١).

٢ تأريخ الطبري (١٣٤/٦).

دەکەن‌و لە دین دوورکەوتوونەتەوەو عوزرتان لە قەباحەتتان خراپترەو، خەڵکانی دزو قۆڵبڕو هەلپەرست پەنا دەدەن‌و، هەر یەکێکتان بەرگری لە لە جحێڵانی خراپی خۆی دەکات‌و، کارێك دەکات نە لە سزا دەترسێت‌و، نە ئومێدیشی بە قیامەت هەیە، ئێوە هیچتان ئاقڵمەند نین، بەڵکو بە دوای خەڵکی گێل کەوتوون، بەردەوام دەستتان لە پشت دان تا بێ حورمەتی‌و بێ ڕێزییان لە بەرانبەر ئیسلام ئەنجام دا، ئێستاش خۆیان لە پشت ئێوە حەشارداوەو لە کونج‌و قوژبنەکاندا کۆڕو کۆبوونەوەی گوماناوی دەبەستن، هەتا ئەو بارو مەیخانانەیان بەسەردا نەڕوخێنم‌و نەسوتێنم‌و لەگەڵ زەویان تەخت نەکەم خواردن‌و خواردنەوەم پێ حەرام بێت، من پێم وایە کاروباری یەکەمین نەوەی ئوممەت بە چ چاك بوو، کاروباری دواهەمین چینی ئوممەتیش تەنها هەر بە ئەو شتە چاك دەبێت، کە بریتیە لە سیاسەتی نەرم‌و نیانی دوور لە دەستەپاچەیی‌و توندوتیژی‌و تۆبزی، ئیدی سوێند بێ بە خودا هەتا ئەو کاتە ڕێکوپێك دەبن (گەورە بە خزمەتکارو هاتوو بە ڕۆیشتوو، ساغ بە نەخۆش)تان لێ دەگرم، تا وای لێ دێت یەکێکتان تووشی براکەی دەبێت‌و دەڵێت: سەعد دەرباز بە سەعید لەنێو چوو، بزانن درۆی سەر مینبەر بە زراوی دەمێنێتەوە، ئەگەر درۆیەکتان پێوە دیتم حەڵاڵە سەرپێچیم بکەن.[1] هەر کەسێکتان بە شەو بەسەری دادرا، من زامنی هەموو ئەو شتەم کە لە دەستی دەچێت، خۆتان لە گەڕان‌و سوڕانی شەوانە بپارێزن، هەر شەوگەڕێکم بۆ لا بێنن بێ سێ‌و دوو خوێنی دەڕێژم، سەبارەت بە ئەم بڕیارە بە ئەندازەی ئەوەی هەواڵدەر دەچێتە (کوفە)و دێتەوە لام مۆڵەتتان دەدەم، خۆتان لە بانگەشەی جاهیلی[2] بپارێزن، هەر کەسێك ببینم بانگەشەی بۆ بکات زمانی دەبڕم، خراپەی واتان بەرپا کردووە کە هەتاکو ئێستا نەبووە، بۆ هەر تاوانێك سزایەکمان داناوە، هەر کەس کەسێك بخنکێنێت دەیخنکێنمەوە، ئاگری تێبەردا دەیسوتێنمەوە، خانوویەك ببڕێت‌و کونی بکات هەناوی کون دەکەمەوە، گۆڕێك (بۆ دزینی کفن) هەڵداتەوە بە زیندوویی دەینێژم،[3] دەست‌و زمانتان لە ڕاست من ببەستن، دەست‌و ئازارم لە ڕاستتان ڕادەگرم، هەر کەسێکتان پێچەوانەی ئەو بەڵێنەی عامەتان لەسەریەتی بجولێتەوە گەردنی دەپەڕێنم، هەندێك ڕق‌و

---

١ مرويات خلافة معاوية (ص: ٢٤٠).

٢ بانگەشەی جاهیلی: بریتیە لە شانازیکردن بە ڕەگەزو ڕەچەڵەك‌و خۆ بە زلزانی‌و خۆسەپاندن.

٣ بە لای (جاحظ)ەوە: (بە زیندوویی تێی دەهاوێژم) البيان والتبيان (٢/٢٣٠).

قینە لە نێوان منو کەسانێکدا پەنگی خواردۆتەوە، بەڵام من ئەمەم پشتگوێ خستووەو خستوومەتە ژێر پێمەوە، کێ لە ئێوە چاکەکارە با لە چاکەکانی زیاد بکات، کامەشتان خراپەکارە با خۆی لە بەرگی خراپەکاری دامالێت، ئەگەر بزانم کەسێك بە داخو ڕقی منەوە سیلو سندان کوشتوویەتی دەمامکی لێ داناماڵمو نهێنیەکەی لێ ئاشکرا ناکەم، تا کاتێك کە خۆی دەردەخات ئەگەر واشی کرد مشتومڕی لەگەڵ ناکەمو لەگەڵی پێدا ناچم، درێژە بە کارەکانتان بدەنو هاریکاری یەکتر بکەن، لەوانەیە کەسانێك بە هاتنمان نائومێدو دڵتەنگ بووبن، بەڵام لەمەولا خۆشنودو شادومان بن، لەوانەشە خەڵکانێك بە هاتنمان دڵشاد بووبن، بەڵام لەمەولا نائومێدو خەمبار بن،[1] ئەی خەڵکینە: ئێمە بەسەر ئێوەوە کراوینە سیاسەتمەدارو کارهەڵسوڕێنەرو بەرگریکاری مافەکانتان، بە حوکمی خودا ئەو دەسەڵاتەی پێداوینو سەرۆکایەتیتان دەکەینو بەو ماڵو سامانو دەستکەوتە جەنگیانەی تێیدا سەرپشك کراوین بەرگریتان لێ دەکەین، مافی ئێمە بەسەرتانەوە ئەوەیە: دەبێ لە هەر شتێك پێمان خۆشە گوێڕایەڵوفەرمانبەردارمان بن، مافی ئێوە بەسەر ئێمەوە ئەوەیە: دادپەروەرانە سەرپەرشتیتان بکەین،جا بە نواندنی دڵسۆزی خۆتان بۆ ئێمە دادپەروەریو سۆزو چاکەی ئێمە بۆ خۆتان دەستەبەر بکەن، من ئەگەرچی کەمتەرخەمیش بم، بەڵام ئەگەر کەسێك بە شەویش لە دەرگام بداتو پێویستی هەبێت، ئەوا بۆی جێبەجێ دەکەمو ڕزقو ڕۆزی ناگرمەوەو، پێدانی (موچە)ش لە کاتی خۆیدا ڕاناگرمو، سوپاش لەنێو خاکی دوژمنداو دوای جێبەجێکردنی نەخشەکەی لە گێڕانەوە بە درەنگ ناخەم، جا دوعای چاکەو چاکبوون بۆ سەرۆكو پێشەواکانتان بکەن، ئەوان سیاسەتمەدارو مشورخۆرتاننو ئەشکەوتو هەیوانی تێدا حەوانەوەتانن، هەر کاتێك ئێوە چاك بن ئەوانیش چاك دەبن، دڵەکانتان بە تورەیی ئەوان ئاو مەدەن، دەنا ڕقتان ئەستوور دەبێتو نێوانتان لەگەڵیان فراوان دەبێو دەستیان بە پێویستیەکانتان ڕاناگات، خۆ ئەگەر بۆشتان جێبەجێ بێ بە خراپ بەسەرتاندا دەشکێتەوە، لە خودا دەپاڕێمەوە هەموو لایەك بکاتە هاریکارو دەستبارگری یەکتری، ئەگەر منتان بینی فەرمانێکتان بەسەردا دەدەم خێرا جێبەجێی بکەن، با هەر یەکێك لە ئێوە خۆ لە زۆرانبازیکردن لەگەڵ مندا ببوێرێتو خۆی لەوە دوور بخاتەوە من لە زەوی دەم، (عبداللەی کوڕی أهتم) هەستاو وتی: ئەی ئەمیر: من شایەتی دەدەم کە تۆ بەهرەی زانایی

---

[1] تأريخ الطبري (١٣٦/٦).

داناییو قسەی ڕوونو ڕەوانو یەکلاکەرەوەت پێ بەخشراوە، (زیاد) وتی: درۆت کرد، ئەو کەسە -ی ئەم بەهرەی پێدرابوو- نەبی داود بوو (سەلامی خوای لێ بێت)،[1] (ئەحنەف) وتی: ئەی ئەمیر: وتەکانت ڕێکوپێکو لەبار بوون، مەتحو ستایش دوای بەلاو سزا دێت، سوپاسو پێزانین پاش بەخشین دێت، ئێمە (وا ڕاهاتووین) تا تووشی سزاو بەلا نەبین مەتحو ستایش نازانین، (زیاد) وتی: ڕاستت وت.[2]

ئەم وتارە بە یەکێك لە وتارە گرنگەکانی مێژوو دادەنرێتو لەگەڵ درێژییەکەیو زۆری ئەو سەرچاوانەشدا کە هێناویانە، بەڵام بە سەنەدێکی وا صەحیح نەهاتووە تا خوێنەر لە بەرانبەر دروستی نێوەڕۆکەکەیدا دڵنیا بکات، بە تایبەتی کە ڕەخنەگەلێکی لێ دەگیرێنو دژایەتییەکی ڕوونو ئاشکرا لەنێوان قسەکاندا هەن وا لەو وتارە دەکات ئاستی ڕاستو دروستیەکەی دابەزێنێتو گومان لەسەر ئەوە پەیدا بکات کە بدرێتە پاڵ (زیاد)، ئەمەو (دکتۆر خالد الغیث) -خوا دەست بە تەمەنیەوە بگرێت- هۆشداری لە بەرانبەر ئەم دژ بەیەکادانەی نێوی داوە.[3] هەندێکیان لێ دەخەینە ڕوو:

- وتارەکە باس لە بڵاوبوونەوەی تاوانو زۆربوونی ماڵانی خراپو داوێن پیسی نێو (بصرە) دەکات:

ئەمە لەم وتەیەی زیاد دەناسرێتەوە کە دەڵێت: (لە بەرانبەر پەیدابوونی ئەو هەموو نادیو قەحپەخانانەدا بێ دەنگ وەستاون، ......، خواردنو خواردنەوەم لێ حەڕام بێ هەتا لەگەڵ زەوی تەختیان نەکەم، یان نەیانسوتێنم.[4]

لە ڕاستیدا دروستبوونی شاری (بصرە) لە سەردەمی (عمری کوڕی خطاب) -ڕەزای خوای لێ بێت-ەوە، وەکو مەڵبەندێك بۆ تێدا دەرچوونی سوپاکانی ئیسلامو درێژەپێدانی بزووتنەوەی (فتوحات)و پەخشکردنەوەی ئایینی ئیسلام بەنێو وڵاتە فەتحکراوەکانداو، نیشتەجێکرانی زیاتر لە سەدو پەنجا (١٥٠) هاوەڵ تێیدا بۆ بە ئەستۆگرتنی باری گرانی بانگەوازو پەروەردەو فێرکردن، ئەم وتە نەشیاوو ناشیرینە سەبارەت بە واقیعی (بصرە) ڕەت دەکاتەوە کە لە کاتی هاتنی (زیاد)دا بوونی هەبووبێت، سەرهەڵدانو تەشەنەکردنی

---

١ تأریخ الطبري (١٣٧/٦).

٢ تأریخ الطبري (١٣٧/٦).

٣ مرویات خلافة معاویة في تأریخ الطبري (ص: ٢٤٤).

٤ تأریخ الطبري (١٣٥/٦).

ئەم تەرزە تاوانانە لە کۆمەڵگایەکدا کە بڕبڕەی پشتی هاوەڵان‌و شوێنکەوتووان بووبن تا بڵێی دوورەو، ئەگەر پەیداش بووبن ناکرێت ئەوان بەرهەڵستیان نەکردبێت‌و بێ دەنگ وەستابن، هەروەها بوونی گروهی (خەواریج) لەو شارەدا بەڵگەیەکی ترە لەسەر لەئارادا نەبوونی ئەم جۆرە تاوانانە لە کۆمەڵگەی (بصرە)داو، بە تایبەتیش بەو جۆرو قەبارە زلەوە کە لە وتارەکەی (زیاد)دا هاتووە، چونکە (خەواریج) توندو تەنگە پرێسکە بوون‌و باریان بەوەوە گرتبوو کە بەبێ هەڵوێستەکردن فەرمان بە چاکە بکەن‌و ڕێگریش لە خراپە بکەن.[1]

یەکێکی تر لەو قسە دژبەیەکانەی کە لە وتارەکەدا هەن، ئەم وتەیەی (زیاد)ە کە دەڵێت: بەئاگا بن‌و خۆتان لە بانگەشەی سەردەمی جاهیلی بپارێزن، هەر کەسێك ببینم‌و بانگەشەی بۆ دەکات زمانی دەبڕم،[2] لەگەڵ ئەمەداو لە شوێنێکی تری وتارەکەدا بە دژی ئەم قسەیەی ڕەفتار دەکات‌و دەڵێت: سوێند بێت بە خودا: لە بەرانبەر هەر تاوانێکدا سەید بە بەندەو نیشتەجێ بە ڕەوەندو هاتوو بە ڕۆیشتووو ساغ بە نەخۆش دەگرم.[3]

هەر لە وتارەکەدا ئەم دوو قسە دژ بە یەکە هاتووە:

(زیاد) دەڵێت: خۆ لە گەڕانی شەوانە ببوێرن، هەر شەوگەڕێکم بۆ لا بێنن بێ سڵەمینەوە خوێنی دەڕێژم،[4] بەڵام کەمێك دوای ئەمە دەڵێت: هەر کەسێك پێویستیەکی هەبێت دەرگای ماڵی لەسەر داناخەم، ئەگەر بە شەویش لە دەرگام بدات بۆی جێبەجێ دەکەم.[5] بێگومان سەیرو نامۆیە، بەڵکو دوورە هەموو ئەم وتە دژبەیەکانە لە کەسێکی وەکو (زیاد)ەوە دەرچووبن کە لە کاتێکدا بە کەسێکی قسەزان‌و وتارڕەوان ناسراوە، ئەمە بەرەو شتێکی ترمان پەلکێش دەکات، کە ئەوەیە: ڕەنگبێ ئەم وتارەی کەوتۆتە بەر دەستی ئێمەو بە هی کاتی سەرەتای هاتنە (بصرە)ی ناسراوە، بریتی بێت لە چەند وتارێك‌و پاشان پێکەوە لکێندرابن، ستایش‌و پێدا هەڵدانەکەی (زیاد) لە لایەن (عبدالله ی کوڕی ئەهتەم)و (أحنف ی کوڕی قەیس)ەوە دوابەدوای کۆتایی هاتنی وتارەکەی پشتگیری ئەم ڕایە دەکات، چونکە

---

١ مرويات خلافة معاوية في تأريخ الطبري (ص: ٢٤٤).
٢ تأريخ الطبري (١٣٥/٦).
٣ تأريخ الطبري (١٣٥/٦).
٤ المصدر نفسه (١٣٥/٦).
٥ المصدر نفسه (١٣٦/٦).

هەندێك لە وتارەكە بە حوكمی پێشخستنی حوكمی جاهیلی بەسەر حوكمی خودادا دەبێتە جێگەی ڕەخنەو ناڕەزایی نەك ستایش‌و پێهەڵگوتن.[١]

(الشعبي) دەڵێت: گوێم لە هەر وتاربێژێك ڕاگرتبێت‌و وتاری جوانی دابێ لە ترسی ئەوە مەبادا تێكیدا حەزم كردوە كۆتایی پێ بێنێت، تەنها (زیاد) نەبێت، ئەو كە وتاری دەدا تا درێژی دەكردەوە قسەی جوان‌و ڕەوانتری بۆ دەهاتن.[٢] ئەم ستایشەی (زیاد) لە لایەن (الشعبي)یەوە، ئەو گومانە بەهێزتر دەكات كە پێی وایە وتارە (بەترا)كەی مەڕ زیاد (كە لە ڕیوایەتەكەی پێشدادا هات) هی زیاد بووبێت.[٣]

شـ- (زیاد)و پشت بەستنی بە هاوەڵانی پێغەمبەری خودا (ﷺ):

زیاد پشتی بە ژمارەیەك هاوەڵی پێغەمبەری خودا (ﷺ) بەست، لە نێوانیاندا: (عمرانی كوڕی حصینی خوزاعی)[٤] كە پۆستی دادوەری (بصره)ی پێ سپاردو، (حكم ی كوڕی عمروی غەففاری)[٥] كە پۆستی ویلایەتی (خۆراسان)ی پێ سپاردو، (سمرةی كوڕی جندب‌و، أنسی كوڕی مالك‌و، عبدالرحمنی كوڕی سەموره)، ئەمەو (عمران) داوای لێكرد لێی ببورێت‌و پۆستەكەی ڕادەست كردەوە، (زیاد)یش لێی قوبڵ كرد، ئەمجا پۆستی دادوەری شاری (بصره)ی بە زنجیرە بەم هاوەڵانە سپارد:

(عبدالله ی كوڕی فوزاڵەی لەیسی)،[٦] پاشان (عاصمی كوڕی فوزاڵەی لەیسی)[٧]ی برای (عبدالله)، دوای ئەویش (زورارەی كوڕی ئەوفای حەڕشی)[٨]ی ژنبرای زیاد ،چونكە (لوبابە)ی خوشكی هاوسەری زیاد بوو.[٩]

---

١ مرويات خلافة معاوية في تأريخ الطبري (ص: ٢٤٦).

٢ المنتظم لابن الجوزي (٥/٢١٢).

٣ مرويات خلافة معاوية (ص: ٢٤٧).

٤ ساڵی ٥٢ك لە (بصره) كۆچی دوایی كردووە، (أصحاب التسعة) فەرموودەیان لێ گێڕاونەوە/ التقريب (٤٢٩).

٥ ساڵی ٥٠ك لە (مروه) كۆچی دوایی كردووە، (بوخاری)و (٤) پێشەواكە لێیان گێڕاوەتەوە/ التقريب (١٧٥).

٦ التقريب لابن حجر (ص: ٣١٧).

٧ الاصابة (٣/٥٧٤).

٨ ساڵی ٩٣ك لە نوێژدا وەفاتی كردوە/ التقريب (٢١٥).

٩ أنساب الاشراف (٤/٣٧٠).

ل- هەندێك لە سیاسەتی (زیاد) لە عێراقدا:

دوابەدای (عبدالله ی کوڕی عامر)و (مغیرەی کوڕی شوعبە)، (زیادی کوڕی أبی سفیان) بە سێهەمین والی دێتە هەژمار کە (معاویە) کاروباری (بصرەو کوفە)ی پێ سپاردبوون، زیاد بە هۆی تواناو دەسەڵاتی تۆکمەو تەواوو سەرکەوتووانەیەوە، توانی لە باڵی خۆرهەڵاتی دەوڵەتی (ئومەوی) ژمارەیەك کاری گرنگ و پێویست و زەروری ئەنجام دا.[1]

سەرەتا لە ماوەی (٤٥-٥٠)ك لە (بصرە)دا چەند قانون و ڕێساو ڕێکخستنێکی داهێناو ژمارەیەك چاکسازی ئەنجام دان، لە ساڵی (٥٠-٥٣ك)ی و پاش ئەوە وێڕای (بصرە) شاری (کوفە)ش خرایە ژێر قەڵەمڕەوی ویلایەتی ئەوەوە لەسەر ئەم پێڕەوەی بەردەوام بوو، خانویەکی بۆ تێدا دانانی ڕزق و ڕۆزی لە (بصرە)دا دروست کرد،[2] کە زیاتر بە کۆگای خۆراك یان (سایلۆ)ی ئیمڕۆ دەچوو، ئیتر دانیشتوان بۆ وەرگرتنی بەشە خۆراکی خۆیان و لە کاتی دیاریکراودا پەیوەندیان بە ئەوێوە دەکرد، ژمارەیەك چاودێرو سەرپەرشتیاری بەسەرەوە دانان، (عبداللەی کوڕی حارثی کوڕی نوفل و روّادی کوڕی أبي بکرة) لە ڕیزی ئەو چاودێرانەدا بوون، بە هەمان جۆر (جعدی کوڕی قەیسی نەمری) کردە سەرپەرشتیارو چاودێر بەسەر بازاڕو نرخەکانی خۆراك تێیدا،[3] لە پێناو ڕاگرتنی هاوسەنگی بازاڕو پاراستنی نرخی کەلوپەلەکان بە تایبەتی لە کاتی بەرزبوونەوەی نرخەکان قەرزی بە بازرگانان دەدا تا کەلوپەل و خۆراکی پێ بکڕن و بیخەنە بازاڕەوە، کاتێك بازاڕ دەشکایەوەوپێداویستیەکان زۆر دەبوون و بارودۆخ لەنگەری دەگرت پارەو سامانەکەی خۆی دەگێڕایەوە.[4]

بە مەبەستی پێدانی موچە دانیشتوانی (بصرە)ی کردبوو بە پێنج بەش و هی (کوفە)شی لە جیاتی (حەوت) کرد بە چوار بەش، بۆ هەر بەش و دەستەیەك لەو هۆزانە (عەریف)ێکی داناو کاری دابەشکردنی موچەکانی پێ سپاردبوو، هاوکات لەگەڵ ئەمەدا چ شتێك لە لای ئەوەوە ڕوویدابایە لێی بەرپرسیار بوو، لە لایەن زیادەوە لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکرا، دەبووایە سەبارەت بە ئەمە خاڵ بە خاڵ ڕاپۆرتی خۆی پێشکەش بە زیاد کردبایە، ئەمەو زیاد کاروباری نێوخۆی هەردوك شارەکەی بە هۆی پیاوانێکی نێویانەوە ڕێکخستن و بڕیاری دا کە نابێت کەس لە دوای نوێژی خەوتنان لەم دوو شارە دەرچن و بێنە نێویەوەو، سزای

---

١ خلافة معاوية بن أبي سفيان للعقيلي (ص: ٨٦).

٢ أنساب الاشراف (٤/٣١٤)، خلافة معاوية (ص: ٨٧).

٣ خلافة معاوية (ص: ٨٧)، نقلا عن انساب الاشراف (٤/٢١٢، ٢١٧).

٤ أنساب الاشراف (٤/٢٣٧).

شـەرعی بەسـەر دزو جـەردەو ڕێگرانـدا سـەپاندو هێمنایـەتی‌و دڵنیـایی باڵیـان بەسـەر بارودۆخەكـەدا كێـشا، بـە جۆرێـك، ژن دەیتـوانی لـە مـاڵی خۆیـدا بخـەوێت‌و دەرگاكەشـی دانەخات‌و، شتێك لـە زەوی كەوتبایـە وەكـو خـۆی دەمایـەوەو كـەس هـەڵی نەدەگرتـەوە،[١] لیستەی موچەی لە (دیوان) ساغ كردەوەو ناوی خەڵكانی (مردوو، نادیارو، گێرەشێوێن)انـی تێدا سڕینەوە، هەر كە مانگی (شەعبان) دەهات، موچەی دەدا بـە جـەنگاوەران‌و ماڵیـان بـە شیرینی‌و مزرەمەنی پڕ دەكردو، بەم چەشنە پێشوازییان لە مانگی (ڕەمـەزان) دەكـرد، هـەر كە مانگی (قوربان) دەهات موچەی بەسەر ژن‌و منداڵاندا دابەش دەكرد،[٢] (البلاذري) ئامـاژە دەدا كـە: هـەر خێزانێـك دوو تـەغار خـۆراك‌و سـەد درهـەم‌و (٥٠) پـەنجا درهـەم جێژنانـەی ڕەمەزان‌و پەنجای تریش جێژنانەی مانگی قوربانی پێ دەدرا.[٣]

هـەروەها (زیـاد) لـە (بـصره)دا (٥٠٠) پێـنج سـەد پیـاوی ئـەو شـارەی كـردە پاسـەوانی تایبەتی خۆی‌و شوێنە گرنگەكان‌و، موچەی سێ سەد تا پێنج سەد درهـەمی بـۆ هـەر یـەكێك لەوان بڕیەوەو، (شیبانی كوڕی عبداللەی كـوڕی سـعدي) بەسـەرەوە كردنـە سـەركردەو، بـە شەوو ڕۆژ لە مزگەت دەمانەوە،[٤] (زیاد) ژمارەیەك مزگەوتی دروسـت كـردن، مزگـەوتی (بـنی عدی‌و، بنی مـشاجع‌و، ئەساویرە) لـە ڕیـزی ئـەو مزگەوتانـەدا بـوون، نەیدەهێشت لـە تـەك مزگـەوتی (الجماعـة)ەوە هـیچ مزگـەوت دروسـت بكـرێن، مزگـەوتی (بـنی عـدی) نـزیكترین مزگەوت بوو لەوێوە،[٥] (إبـن الفقیـە) دەڵێـت: (زیـاد) حـەوت مزگـەوتی دروسـت كـردن‌و هـیچ كامێكیان بە ناوی ئەوەوە ناو نەنران، پانتایی هەر مزگەوتێك بازنەیی هەڵكەوتبێت ئەوە هـی (زیاد)ە،[٦] ئەمەو ڕووبەری مزگـەوتی (بـصره)ی فـراوان كـردو دیوارەكـانی بەخـشتەی سـوور (ئاجوڕ)و گەچ هەڵی چنینەوەو سەربانەكەشی بـە (سـاج) گـرت‌و (منـارە)كەشـی بـە (بـەرد) بەرزكردەوە.[٧]

---

١ تأريخ الطبري، نقلا عن خلافة معاوية للعقيلي (ص: ٨٨).

٢ أنساب الاشراف (٤/٢١٩).

٣ خلافة معاوية (ص: ٨٨)، نقلا عن انساب الاشراف (٤/ ٢٢١).

٤ المصدر نفسه (ص: ٨٩)، أنساب الاشراف (٤/٢٢١).

٥ مختصر كتاب البلدان (ص: ١٩١).

٦ الادارة في العصر الاموي (ص: ١٦٠).

٧ فتوح البلدان (ص: ٣٤٦، ٣٤٧)، خلافة معاوية (ص: ٨٩).

بایەخی زۆری بە پاكو خاوێنی شار دەداو، ئەندامانی هەموو ماڵێك لە بەرانبەر پاكو خاوێنی ماڵەکەیان‌و دەوروبەری ماڵەکەیان بەرپرسیار بوون‌و هەر کەسێك کەمتەرخەمی کردبایە سزا دەدرا، هەر خاوەن ماڵێك دوای باران دەبووایە قوڕو قاڵی دەوروپشتی خانوەکەی لابردبایە، ئەگەر پاکی نەکردبایەوە فەرمان دەکرا قوڕو قاڵەکەی بۆ هەڵدەنە نێو ماڵەکەیەوە، ئیدی دەبوایە خەڵکانی گەڕەك کۆڵانەکەیان لە خۆڵ‌و خاشاك‌و پیس‌و پۆخەڵی ڕزگارکردبایەو بیانماڵیبایە، پاش ئەمە ژمارەیەك کۆیلەی کڕین‌و ئەم کارەی پێ سپاردن.[١] ئەم ڕیوایەتە ئاماژە بە هەبوونی چەند کارمەندێك دەدا کە کاری چاودێریکردنی پاك‌و خاوێنیان لە ئەستۆدا بووە، لە لایەکی تریشەوە ئاماژە دەدا کە (زیاد) بە پێویستی داناوە پاك‌و خاوێنی ڕێگاوبانەکان لە لایەن کەسانێکی دیاریکراوەوە سەرپەرشتی بکرێت‌و، بە خاتری ئەمە ژمارەیەك کۆیلە دەکڕێت‌و ماڵینی ڕێگاو کۆڵانەکانیان پێ دەسپێرێت.[٢]

(زیاد) بایەخی بە پێشخستنی کشتوکاڵ‌و ڕێکخستنی جۆگاکانی ئاودێری داو، بەنداوی دروستکردن‌و[٣] جۆگای هەڵبەستن،[٤] پارچە زەویەکی بە ڕووبەری جێبنەتۆوی (٦٠) شەست تەغار دەدا بە جوتیارێك‌و، ماوەی دوو ساڵ لێی دەگەڕا، ئەگەر کشتی کردبایە دەبوو بە هی خۆی، دەنا لێی دەسەندەوەو، دووبارە دەیدایەوە جوتیارێکی ترو چاوەڕێی کشتکردنی لێ دەکردەوە،[٥] بە خاتری بەئاسانی هەڵبەستنی ئاوی ڕووباری (فورات) پردەکەی کوفەی چاك کردەوە، پێشدا کە بە تەختەی بەلەم‌و کەشتیە شکاوەکان دروستکرابوو، هەستا دیوارو پایەکانی‌و سەرەکەی بە خشتەی سوورکراوەو ئاجوری بەهێزو مەحکەم هەڵچنیەوە، ئیتر لەو کاتەوە بە (پردی کوفە) ناوی دەرکرد.[٦]

بەڵام سەبارەت بە مامەڵەی زیاد لە بەرانبەر داهاتی بەیتولماڵەی ویلایەت، (البلاذری) ئاماژە دەدا کە: (زیاد) شەست ملیۆن -درهەم-ی لە دێهاتەکانی (بصرە) وەردەگرت، لە کۆی ئەمە سی‌و شەش ملیۆنی لێ دەدا بە جەنگاوەران‌و شانزە ملیۆنی لێ دەدا بە خێزانەکان، دوو ملیۆنی لە خەرجیەکانی دەسەڵات خەرج دەکردو، (دوو ملیۆن)یشی لە

١ أنساب الاشراف (٢٠٦/٤)، الادارة في العصر الاموي (ص: ٢١٤).
٢ الادارة في العصر الاموي (ص: ٢١٤).
٣ خلافة معاوية (ص: ٨٩).
٤ فتوح البلدان (ص: ٣٥٦، ٣٦٢، ٣٦٩).
٥ خلافة معاوية (ص: ٩٠).
٦ فتوح البلدان (ص: ٤٨٥، ٤٨٦).

بەیتولمالـە بـۆ لێقـەوماوو کارەسـاتباران تـەرخان دەکـردو (چـوار ملیـۆن) درهەمیـشی بـۆ (معاویە) دەنارد، چل ملیۆن درهەمیشی لـە (کوفـە) وەردەگـرت، لـە کـۆی ئـەم داهاتـەو بـە حوکمی ئەوە داهاتی (کوفە) ٣\٢ی داهاتی (بصرە) بووو، ٣\٢ی چـوار ملیـۆن درهـەمی بـۆ (معاویە) بەڕێ دەکـرد، بـە هـەمان جـۆر (عبیـدالله ی کـوڕی زیـاد) کـە پاشـان جێـی بـاوکی گرتەوەو بوو بە والی (عێراق)، ساڵانە شەش ملیۆن درهەمی بۆ (معاویە) دەبرد، جا (معاویـە) وتی: خودایە لە برازایەکەم ڕازی بی.[١]

٤- ویلایەتی (سمرەی کوڕی جندب) (ڕەزای خوای لێ بێت):

لە (جعفری کوڕی سلیمان الضبعي)یەوە: (معاویە) ماوەی شەش مانگ (سمرة)ی لە دوای (زیاد) کردە والی (عێراق) و پاش ئەمە لایدا، درۆیـان بـە دەم (سـمرة)ەوە هەڵبەسـتبوو، کـە گوایە وتوویـەتی: (معاویـە) بـەر نـەفرەتی خـودا بکـەوێت، بـە خـودا ئەگـەر بـەو شـێوەیەی فەرمانبەرداری (معاویـە) دەکـەم فەرمانبـەرداری خـودام کردبایـە هـەرگیز سـزای نـەدەدام.[٢] بێگومـان ئـەم هەواڵـە کـە پاڵدراوەتـە لای (سمـرة) -کـە هـاوەڵێکی بـەرزو بـەڕێزە- درۆو بوختانە، (ابن کثیر) دەربارەی ئەمە دەڵێت: ئەمە بە ڕاست دانانرێـت کـە لـە لایـەن ئـەوەوە وترابێت،[٣] لە لایەکی ترەوە سەرچاوەی هەواڵەکە (جعفر کوڕی السلیمان الضبعي)یـەو، (إبـن حجر) دەربارەی دەڵێت: ڕاستگۆو دنیانەویست بوو، بەڵام شیعەچـێتی دەکـرد،[٤] ئـیتر دیـارە کە شیعەگەرێتی چەند کاریگەری لەسەر شێواندنی مێژووی ئیسلام هەبووە.[٥]

٥- ویلایەتی (عبداللەی کوڕی عمروی کوڕی غیلان الثقفي):

(الطبري) دەڵێت: لەم ساڵەدا -واتە- ٥٤ك لێخرانی (سـمرەی کـوڕی جنـدب) لـە پۆسـتی ویلایەتی (بصرە) لـە لایـەن (معاویـە)وە جێبـەجێ کـراو، (عبـدالله ی کـوڕی غـیلان)ی کـردە (والی).[٦]

---

١ أنساب الاشراف (٤/٢١٨، ٢١٩).

٢ مرويات خلافة معاوية في تأريخ الطبري (ص: ٢٦١).

٣ البداية والنهاية، نقلا عن مرويات خلافة معاوية في تأريخ الطبري (ص: ٢٦٢).

٤ تقريب التهذيب (ص: ١٤٠).

٥ مرويات خلافة معاوية (ص: ٢٦٢).

٦ تأريخ الطبري (٦/٢١٢).

٦ـ ویلایەتی (عبیدالله ی کوڕی زیاد) بەسەر (خۆراسان)و پاشان (بصره)ەوە:

(الطبري) دەڵێت: هەر لەم ساڵەدا واتە –٥٤ك– (معاویە) (عبیدالله ی کوڕی زیاد)ی کردە والی (خۆراسان)،[1] لە ساڵی ٥٥کۆچیدا (معاویە) (عبدالله ی کوڕی غیلان)ی لە پۆستی ویلایەتی (بصره) دابەزاندو، (عبیدالله ی کوڕی زیاد)ی کردە والی ئەویو[2] ئەم وەسێتەی بۆ کرد: بە چەشنی پەیمانی کاربەڕێوەبەرەکانی ترم ئەم کارەت پێ دەسپێرم، ئەمجا بە خاتری جیاواز بوونو تایبەت بوونت بە لای منەوە وەسێتێکی خزمایەتیت بۆ دەکەم: زۆر بە کەم مەفرۆشە، بۆ خودی خۆت لە خۆت بگرەوە، دەرهەق بە نەیارەکانت بەو پەیمانەوە پابەند بە کە پێت داون، بەمە ئەرکی سەر شانی خۆتو ئێمەش سوك دەکەی، با دەروازەت لە ڕووی خەڵکدا ئاوەڵا بێت، بەمە هەردوکلاتان لێکتر حاڵی دەبن، ئەگەر عەزمت لەسەر ئەنجامدانی کارێك جەزم بوو بۆ خەڵکی ئاشکرا بکە، با کەس بە جۆرێك تێی نەتۆڕێت، کە توانای ئەنجامدانیشت هەبێت پاشگەزت نەکاتەوە، ئەگەر دەستەویەخەی دوژمنانت بویتەوەو لەسەر پشتی زەوی بەسەرتدا زاڵ بوون نەکەی لەنێو سکی زەویشدا بەسەرتدا زاڵ بن، ئەگەر هاوەڵەکانت پێویستیان پێت بوو هەوڵ بدە خۆتیان بەلاگێر بکە،[3] بە گوێرەی ڕیوایەتێکی تر پێی وت: پارێز لە خودا بکەو نەکەی هیچ شتێك پێش تەقوای خودا بخەی، هەر کەس تەقوا ڕەچاو بکات قەرەبووی ئەو شتەی دەست دەکەوێت کە لەبەر خودا وازی لێ هێناوە، شەرەفو ناموست بپارێزەو نەکەی بە دەستی خۆت دەگەی لێدەی، بەڵێنو پەیمانت بە هەر کەسێك دا پێیەوە پابەند بە، زۆر بە کەم مەدە، هیچ فەرمانێك تا بە تەواوەتی خۆتی بۆ ئەنجامدانی ساغ نەکەیەوە دەرمەکەو ئاشکرای مەکە، ئەگەر دەریش چوو با پەشیمانت نەکەنەوە، هەرکات ڕووبەڕووی دوژمنەکەت بویتەوە با خەڵکی زۆرت لەگەڵ بێتو سوێندیان بە (قورئان) پێ بخۆ، هەوڵ بدە با کەس جگە لە بەشەمافی خۆی چاو نەبڕێتە بەشە مافی خەڵکانی ترو، کەسیش دەرهەق بە هەقی خۆی نائومێد نەبێتو دەستی لێ نەشوات)، ئەمجا خواحافیزی لێ کرد.[4]

---

١ تأريخ الطبري (٦/٢١٢).

٢ تأريخ الطبري (٦/٢١٧).

٣ تأريخ الطبري (٦/٢١٣).

٤ تأريخ الطبري (٦/٢١٤).

## دووەم: کوفە: ٤١ك:

١ــ (مغيرە)ی کوڕی (شعبة) (ڕەزای خوای لێ بێت):

ئەو میر (أبو عيسى) (أبو عبدالله)شی پێ دەگوترێت، دەشگوترێت (أبو محمد)ە، یەکێکە لە ڕیزی گەورە هاوەڵانو ئازاو بە جەرگو فێڵزان بوو، ئامادەی بەیعەتی (رضوان) بووە، پیاوێکی کەڵەگەتی بە سامو هەیبەت بوو، ڕۆژی غەزای (یەرموك) –بە گوێرەی گێڕانەوەیەکی لاوازیش–ڕۆژی غەزای (قادسیە) چاوێکی لە دەست دا،[1] –بەشانازیەوە– دەیوت: من دواهەمین کەس بووم خواحافیزیو ماڵاواییم لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) کردووە، کاتێك پێغەمبەری خودا (ﷺ) دفن کرا ،ئەنگوستیلەکەم هەڵدایە نێو گۆڕەکەیەوە، وتم: ئەی (ئەبا حەسەن) ئەنگوستیلەکەم!، وتی: دابەزەو هەڵی بگرەوە، وتی: جا هەردووك دەستم بە کفنەکەدا هێناو ئەمجا هاتمە دەرەوە،[2] لە بواری زیرەکیو فێڵزانیو هۆشیاریدا هەڵوێستی زۆری هەن، بۆ نموونە: (زیدی کوڕی أسلم) لە زاری باوکیەوە دەگێڕێتەوە: (عمر) (مغیرەی کوڕی شعبە) دەکاتە کاربەڕێوەبەری (بەحرەین)، خەڵکەکەی چارەیان نەدەویست، (عمر)یش لێی خست، بەڵام خەڵکەکە ترسان دووبارە بیگێڕێتەوە، جا (کوێخا)یەکەیان وتی: ئەگەر ئەوەی من دەیڵێم بە قسەم بکەن بۆ لامانی ناگێڕێتەوە، وتیان: بەڵێ فەرمان بکە، وتی: (سەد هەزار) درهەم کۆبکەنەوە تا بۆ (عمر)ی بەرمو پێی دەڵێم: (موغیرە) ناپاکی کردووەو ئەم پارەیەی داوە بە من، (أسلم) وتی: جا (سەد هەزار)ەکەیان بۆ کۆکردەوەو هەڵیگرتو هاتەلای (عمر)و قسەکەی خۆی بۆ خستەڕوو، جا (عمر) (مغیرە)ی بانگ کردو سەبارەت بە ئەمە پرسیاری لێکرد، (موغیرە) وەڵامی دایەوەو وتی: خودا ساغو سەلامەتت کا درۆ دەکات، دوو سەد هەزار بوو، وتی: چ شتێك هەڵینای ئەمەندەی بدەیتێ؟ وتی: پێداویستیو خێزانی زۆر، جا (عمر) بە کوێخای ڕیشگەورەی وت: چ دەڵێی؟ وتی: بە خوا ڕاستیەکەت پێ دەڵێم، نە کەم نە زۆری پێ نەداوم، جا (عمر) ڕووی لە (مغیرە) کردو وتی: مەبەستت پێ چ بوو لەو وەڵامە؟ وتی: گەندەپیاو بوختانی پێ کردمو منیش حەزم لێ بوو زەبوونو چاوبەرەژێری بکەم.[3]

---

١ سير أعلام النبلاء (٣/٢١).

٢ سير أعلام النبلاء (٣/٢٦).

٣ سير أعلام النبلاء (٣/٢٦).

(الشعبي) دەڵێت: گوێم لە (قبیصەی کوڕی جابر) بوو دەیووت: هاوەڵایەتی (موغیرەی کوڕی شوعبە)م کردووە، ئەگەر شارێك هەشت دەرگای هەبوونایەو بە هەر دەرگایەك دەرچووبایە فێڵێکی هەر بەکار دەهێنا، ئەو بە هەموو دەرگایەکاندا دەردەچوو.[1]

(الشعبي) دەڵێت: ..... زۆرزانەکان چوار کەسن: (معاویە، عمروی کوڕی عاص، موغیرە، زیاد).[2]

(موغیرەی کوڕی شوعبە) یەکێك بوو لە ڕیزی پشتیوانانی بابەتی (فرە ژنە)و، دەیووت: پیاوی یەکژنە لەگەڵ ژنەکەی تووشی حەیزو نەخۆشی دەبێت، بەڵام پیاوی دوو ژنە لە نێوان ڕووناکایی دوو ئاگرە، هەردووکیان وەك گڵۆپ بۆی دایسێن.[3]

ئەو بانگەشەی دەکرد پیاوان سێ چوار ژن بێنن.

ساڵی ٤١ك (معاویە) (موغیرە)ی کردە والی (کوفە)،[4] بایەخی بە جەنگی (خەواریج)داو هەوڵێکی گەورەو گرانی خۆی لەم ڕێیەدا بەخت کرد، مزگەوتی گەورەی (کوفە)ی گەورەو بەرفراوان کرد، بە جۆرێك کە جێگای چل هەزار نوێژخوێن ببێتەوە.[5] هەتا ساڵی ٤٩ك لەسەر ئەم پۆستەی مایەوە، بەڵام بە وتەیەکی تر (کە ئەمەیان پەسندە) تا ساڵی (٥٠)ك مایەوە، کاتێك مرد، (معاویە) ویلایەتی (کوفە)ی لەگەڵ ویلایەتی (بصرە) تێکەڵ کردو ئەوێشی بە هامڕای (بصرە) بۆ یەکەمین جار خستە ژێر دەسەڵاتی (زیاد)ەوە.[6]

٢- (زیاد بن أبیە)و ویلایەتی (کوفە):

هەتا ساڵی ٥٠ك (زیاد) بەس والی (بصرە) بوو، لەو ساڵەدا (موغیرەی کوڕی شوعبە)ی والی (کوفە) کۆچی دوایی کردو، (معاویە) لە بڕیارێکی ڕەسمیدا بۆ زیادی نووسی کە کاروباری (کوفە) لەگەڵ (بصرە) بە ئەستۆی خۆی بگرێت، ئەمەو بۆ یەکەمین جار ئەم دوو ویلایەتە بۆ (زیاد) یەکخرانو زیادیش (سەمورەی کوڕی جوندوب)ی بە جێنشینی خۆی لە (بصرە) داناو، بەرەو (کوفە) بەڕێ کەوت، ئەمجا بە بەرنامە شەش مانگ لە (کوفە)

١ المصدر نفسه (٣/٣٠).
٢ البداية والنهاية (١١/٢٢).
٣ سير أعلام النبلاء (٣/٣١).
٤ تأريخ الطبري (٦/٨٢).
٥ خلافة معاوية للعقيلي (ص: ٨٥).
٦ تأريخ الطبري (٦/١٥٠).

دادەنیشتو شەش مانگی تریش لە (بصرە) دادەنیشت،[١] پێشدا باسی ئەو شێوە سیاسەتەمان کرد کە (زیاد) لە (عێراق)دا پەیڕەوی کردبوو.

(الذهبي) وەصفی دەکاتو دەڵێت: .... ئەو لە بوارەکانی ڕاوبۆچوونو عەقڵو ئاوەزو توندو گشتیو وریاییو زیرەکیو زرنگیەوە لە ڕیزی پیاو ماقوڵە نەجیبەکاندا بوو، لەو بوارەدا بە نموونە دەهێنرێتەوە، نووسەرو ڕەوانبێژ بوو، کاتبایەتی بۆ (موغیرە)و (إبن عباس) کردووەو، پاشان جێگەی (موغیرە)ی گرتەوەو بوو بە والی (بصرە)،[٢] (الشعبي) دەڵێت: کەسم نەدیوە لە وتاردانەدا لە (زیاد) ڕەوانبێژتر بووبێت،[٣] (إبن حزم) دەربارەی دەڵێت: لە ڕاستیدا (زیاد) کە بیرۆکو بێ ئەسڵو نەسەبو پێشینە بوو -یەکەمجار ملی نەدا-،[٤] (معاویە) بە سازان نەبووایە دەرەقەتی نەدەهات، بۆیە ڕازی کردو پۆستی ویلایەتی پێدا.[٥]

(أبو الشعشاء) دەڵێت: (زیاد) لە بەرانبەر هەر کەسێك مەترسی لێکردبایە لە (حجاج) دەستڕەشتر بوو،[٦] کاتێك قاچی لە عێراق چەسپاندنو باڵی بەسەردا کێشا، بۆ (معاویە)ی نووسی: بە دەستو باڵی چەپم (عێراق)م ڕێکخستو بۆم ڕامکردی، دەستو باڵی ڕاستەم بێ کارە، بۆ -ڕامکردنی- (حیجاز)ی بە گەڕخە..... کاتێك ئەم هەواڵە بە دانیشتوانی (حیجاز) گەیشت، وەفدێکیان ناردە لای (عبداللهی کوڕی عمری کوڕی خطاب)و ئەمەیان پێ ڕاگەیاند، (عبدالله) وتی: لە خودا بپاڕێنەوە تا لێتان لادا، جا (عبدالله)و وەفدەکە ڕوویان لە قیبلە کردو لە خودا پاڕانەوە (ئەم بەڵایەیان لێ لادا)، هێندەی نەخایاند پەنجەکانی تووشی شێرپەنجە بوونو، بە دوای (شریح)ی[٧]دا نارد (کە قازی ئەوبوو لە عێراقدا)، وتی: دەبینی چیم بەسەرهاتووە، فەرمانم پێکراوە بیانبڕمەوە، تۆش ڕای خۆتم بۆ بخەڕوو، (شورەیح) پێی وت: من دەترسم ئەجەلت هاتبێتو دەستت بریندار ببێتو ئازار سەر دڵت بگرێتو بە کۆڵی

---

١ تأريخ الطبري (١٥٠/٦).

٢ تأريخ الطبري (١٥٠/٦).

٣ سير أعلام النبلاء (٤٩٥/٣).

٤ المصدر نفسه (٤٩٦/٣).

٥ المصدر نفسه (٤٩٦/٣).

٦ المصدر نفسه (٤٩٦/٣).

٧ (شورەیحی کیندی): سەبارەت بە هاوەڵبوونی ڕای جیاوازی لەسەرە، لە سەردەمی (عمر)ەوە تا سەردەمی (عبدالملك) لەسەر پۆستی قەزا (دادوەری) مایەوە، ٧٨ك کۆچی دوایی کرد.

بگەیتەوە لای خودای بە دەسەلات، یان بە خاتری ئەوە حەز بە گەیشتنەوەی پەروەردگار نەکەیت، یان ئەجەل بە درەنگ بخەی دەستت ببڕیتەوەو پاشان بە کۆڵی بژیتو ڕۆڵەکانت بە هۆیەوە لەکەدار بکرێن–و پێیان بڵێن کوڕانی زیادە کۆڵ–، جا (شورەیح) هاتە دەرەوەو پرسیاریان لێ کرد، چت پێ وت، وەلامی دایەوە: کە ئەمەی پێ وتووە (کە وتبووی)، سەرزەنشتیان کردو وتیان: دەبوایە پێت گوتبایە بیبڕێتەوە، جا وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێت: (المستشار مؤتمن)[1] واتە: ڕاوێژکار ئەمینداره، ئەمەو (زیاد) ساڵی ٥٣ك کۆچی دوایی کرد.[2]

٣ـ ویلایەتی (عبدالله ی کوڕی خالدی کوڕی أسید):

(عبدالله ی کوڕی خالدی کوڕی أسیدی کوڕی أبي العیص)ە، هەرێمی (فارس– شیراز)ی بۆ (زیاد) بەڕێوە دەبرد،[3] ئەمجا (زیاد) لە کاتی سەرەمەرگیدا لە (کوفە) کردی بە جێنشینی خۆی، کە (زیاد) مرد، (عبدالله) نوێژی لەسەر کرد.

٤ـ ویلایەتی (زوحاکی کوڕی قەیسی فەهری):

ساڵی (٥٥)ك (معاویە) (عبدالله ی کوڕی خالد)ی لە پۆستی ویلایەتی (کوفە) دابەزاندو (زوحاکی کوڕی قەیسی فەهری) کردە والی ئەوێ.[4]

٥ـ ویلایەتی (عبدالرحمنی کوڕی عبداللەی ئەقەفی):

ساڵی ٥٨ك (معاویە) (زوحاکی کوڕی قەیسی) لێخستو (عبدالرحمنی کوڕی عبداللەی کوڕی عثمانی کوڕی ڕەبیعەی ئەقەفی) کردە والی (کوفە)، (عبدالرحمن) خوارزای (معاویە) بوو –واتە کوڕی (أم الحکم)ی خوشکی بوو–[5] ئەمەو بە هۆی تێوەگلانی لە کوشتنی نەفەرێکی (ئەهلی ذمە) (معاویە) لە پۆستی ویلایەتی (کوفە)ی دابەزاند، (أحمدی کوڕی حنبل) بە سەنەدێکی صحیح هێناویەتیو دەڵێت: (هارونی کوڕی معروف) قسەی بۆ کردمو وتی: (سوفیان) قسەی بۆ کردووین: کە (مطرف) وتی: (إبن سعد) هەواڵی دامیو وتی: .... ئەمجا کاتێك (إبن صلوبا) کوژرا کوڕی (أم الحکم)یش لێخرا.[6]

---

١ صحیح الادب المفر للألباني (ص: ١١٣).

٢ تأریخ الطبري (٦/٢٠٦).

٣ نسب قریش للزبیدي (ص: ١٨٧).

٤ تأریخ الطبري (٦/٢١٨).

٥ المصدر نفسه (٦/٢٢٦).

٦ التأریخ الکبیر للبخاري (٦/٥٣٣)، العلل ومعرفة الرجال (٢/٢٤، ٢٥)، مرویات خلافة معاویة في تأریخ الطبري (ص: ٢٢٧).

٦ـ ویلایەتی (نوعمانی کوڕی بشیر) (ڕەزای خوای لیّ بیّت) ٥٩ـ٦٠ك:

ساڵی ٥٩ك (عبدالرحمنی کوڕی أم الحکم) لە پۆستی ویلایەتی (کوفە) دابەزێنراو، (نوعمانی کوڕی بشیری ئەنصاری) کرا بە کاربەڕێوەبەری ئەویّ.[1]

ئەمانەی ڕابوردن بریتی بوون لەو کەسانەی لە سەردەمی (معاویە) (ڕەزای خوای لیّ بیّت)دا والی (کوفە) بوون.

## سێهەم: ( مەدینەی ئەبەوی ):

لە ڕووی دەسەڵاتی ڕوحی‌و دینیەوە بە سام‌و هەیبەتترین ویلایەت بوو بەسەر دەوڵەتی (ئومەوی)یەوە، چونکە هاوەڵان‌و ڕۆڵەکانیان لە کۆچەران‌و پشتیوانان لەوێدا نیشتەجیّ بوون‌و هەتا ئەوانیش بەیعەتیان نەدابایە بەیعەت بۆ کەس دانەدەمەزرا، ئەوان ژمارەیەك کەسایەتی ئەهلی (حەلل‌و عەقد)یان تێدا بوون‌و، کەسانێکی وایان هەبوون خەڵك گوێڕایەڵیان بوون‌و بە ڕاوبۆچوونی ئەوان نەبووایە هەڵنەدەسوڕان.[2]

ئەمەو ساڵی ٤١ك –کە بە ساڵی جەماعەت‌و کۆکبوونی ئوممەت ناسراوە– شاری (مەدینە)ش چووە نێو بازنەی دەسەڵات‌و حوکمڕانی (معاویەی کوڕی ابی سفیان)ەوە، ئەو لەو کاتەوە بەیعەتی پێدرا حەزی لیّ بوو سەردانی بکات، ئیتر بەرەو (مەدینە) بەڕیّ کەوت‌و ژمارەیەك لە پیاو ماقوڵانی (قورەیش) بەرەو پیری هاتن‌و وتیان: سوپاس بۆ (خودا) سەرکەوتنەکەتی پتەو کردو دەسەڵاتەکەتی بەرز کردەوە، ئیدی تا نەهاتە نێو (مەدینە) وەڵامی نەدانەوە، جا چووە نێو مزگەوتەوەو ئەمجا چووە سەر (مینبەر)و سوپاس‌و ستایشی خودای کردو وتی: ویستم خۆم هەڵدەمە نێو ئەو گوڕەپانەوە کە (أبوبکر)ی کوڕی قوحافە ئەسپی خۆی تێدا تاو دابوو، هەرچەندم کرد لە خۆم ڕانەدی‌و تاقەتم پیّ نەشکا – وەك ئەو بکەم–، ویستم خۆم لەسەر چالاکیەکانی (عمر) تاقی بکەمەوە، بەڵام زیاتر سام‌و هەیبەتم ڕیّ نیشت‌و چاکتر لێی سڵەمیمەوە، ویستم بە پێی پەیڕەوی (عوسمان) ڕەفتار بکەم، هەر نەمتوانی، کوا وێنەی ئەو کەڵە پیاوانە پەیدا دەبێتەوە؟!، کیّ قودرەتای ئەو کردارانەی هەیە کە ئەوان ئەنجامیانداون؟!، دوورە کەسێك لە دوای ئەوان بێت‌و بتوانێت بگاتە پایەبەرزی‌و مەزنایەتی ئەوان..... بەڵام من ڕێگایەکم گرتۆتەبەر هەم سوودو بەرژەوەندی بۆ من تێدایە، هەم سوودو بەرژەوەندی‌و خواردن‌و خواردنەوەیەکی باش‌و

---

١ تأريخ الطبري (٦/٢٢٣).

٢ التأريخ الاسلامي، العهد الأموي، محمود شاكر (ص: ٩٠).

جوانی ئێوەشی تێدایە، بە مەرجێك هەڵسوكەوت ڕێكوپێك بێتو گوێڕایەڵیو فەرمانبەرداری چاكو پاك بێت، ئەگەر لە هەمووشتان چاكتر نەبم، هەوڵ دەدەم بۆتان چاك بم، بە خودا هەر كەسێك بەرهەڵستیم بكاتو شمشێری پێ نەبێت شمشێری لە دژ بەكارناهێنم، وەكو زانیوتانە هەتا ئێستا ئەم جۆرە شتانەم پشتگوێ خستوون، ئەگەر بینیتان هەموو مافێكتان بۆ دەستەبەر ناكەم ئەوا بەوەندەم لێ ڕازی بن كە بۆتان جێبەجێ دەكەم، خۆتان لە فیتنەو ئاشوب بە دوور بگرنو خۆتانی پێوە سەرگەرم مەكەن، چونكە ئاشوب ژیانو گوزەران دەشێوێنێتو نازونیعمەتەكان تفتو تاڵ دەكات.[١]

دەبینین (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) دەیەوێت لەم وتارەیدا سەرنجیان بە لای خۆیدا ڕاكێشێتو خۆشەویستی ئەوان بۆ خۆی مسۆگەر بكاتو بەڵێنیان پێ بدات هەتا ئەوان ئەو (بەیعەتە) بپارێزن كە بە ئەویان داوە، ئەویش ئەو بەڵێنو پەیمانە دەباتە سەر كە بە ئەوانی داوە.[٢]

ئیتر (مەدینە) دوای بەیعەتدان بە (معاویە) بارودۆخی ئاسایی بۆوەو ئارام بوو، هەر یەكێك لە ئەندامانی دانیشتوانەكەی چوونەوە سەر كاروباری ئاسایی خۆیان، زاناكانیان خۆیان بۆ گێڕانەوەی ئەو فەرموودانە تەرخان كرد كە لە پێغەمبەری خودا (ﷺ)یان وەرگرتبوونو لەبەركردبوون، ئەمەو (معاویە) بە خاتری ڕاكێشانیان بە لای خۆیدا سەروەتو سامانی بەسەر پیاو ماقوڵانی شاری (مەدینە)دا دابەشكرد –كە لە ڕێیانەوە بەسەر تەواوی دانیشتواندا پەخش دەبوو–.[٣]

بەڵێ (معاویە) پابەند بوو بەو سیاسەتو پەیمانەوە كە لە كاتی سەردانی (مەدینە)داو لە میانەی وتارەكەیدا بە دانیشتوانی دا، ئەوەندەی مـوژدەو بەڵێنی بۆ دەردەبڕین قەت هێندەی هەڕەشە ئاراستە نەدەكردن، ئەو ڕێزو حورمەتەی بۆ پیاوانی (مەدینە)ی نیشان دەدا لە سەروی هەموو وەصفێكەوە بوو، هەر كەسێك–خەڵكی مەدینە– داوایەكی لێ كردبایە بۆی جێبەجێ دەكرد، ئەو هەرچەندە تایبەتمەندی بە كەسە دیارو پیاو ماقوڵەكانی دەدا، بەڵام ئەوانیش بەخششو خەڵاتەكانی (معاویە)یان بەسەر دانیشتواندا دابەش

١ البداية والنهاية (١١/٤٣٢).
٢ المدينة في العصر الأموي، محمد شراب (ص: ٧٠).
٣ المصدر نفسه (ص: ٧١).

دەکـردەوە، هـەتا بەخشـشەکانی (خەلیفـە) زۆرتـر بوونایـە، ئـەوانیش زیاتریـان بەسـەر دانیشتواندا دابەش دەکرد.[١]

گێڕدراوەتەوە: (معاویە) بڕی هەژدە هەزار درهەمی قەرز بۆ (عائیشە)ی دایکی ئیمانداران دایەوە (کە لە خەڵکی قـەرز کردبـوو).[٢] (معاویـە) سـەد هـەزار درهـەمی بـۆ (عائیـشە) نـارد، ئەویش لەو ڕۆژە بە دەستی گەیشت بەسەر دانیشتوانیدا دابەش کردو یەك درهەمی بۆ خـۆی نەهێشتەوە، کارەکەرەکـەی پێـی وت: خۆزگـە درهـەمێکت بـۆ خۆمـان لێـی گێڕابایـەوە تـا هەندێك گۆشتمان پێ کڕیبایە؟ (عائیشە) وتی: دەبووایە بە بیرت هێنابامایەوە.[٣]

## والیەکانی (مەدینە) ئەمانە بوون:

**١ـ (مەڕوانی کوڕی حەکەم) ٤٢ـ٤٩ك:**

سـاڵی ٤٢ك (معاویـە) (مـەڕوانی کـوڕی حەکـەم)ی کـردە کاربەڕێوەبـەری (مەدینـە)، (مەڕوان)یش (عبداللهی کوڕی حارثی کوڕی نوفل)ی کردە (دادوەر).[٤]

**٢ـ (سەعیدی کوڕی عاص) (ڕەزای خوای لێ بێت) ٤٩ـ٥٤ك:**

مانگی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی ٤٩ك (معاویە) (مـەڕوان)ی لـە پۆسـتی ویلایـەتی (مەدینـە) دابەزاندو، لە ڕەبیعی دووەمداو وتراویشە هـەر لـە ڕەبیعـی یەکـەمی ئـەو ساڵەدا (سـەعیدی کوڕی عاص)ی کردە والی (مەدینە).[٥]

**٣ـ ویلایەتی دووەم جاری (مەڕوانی کوڕی حەکەم) ٥٤ـ٥٧ك:**

ساڵی ٥٤ك (معاویە) (سەعیدی کوڕی عاص)ی لە پۆستی ویلایەتی (مەدینـە) دابەزانـدو جارێکی تر دایەوە بە (مەڕوانی کوڕی حەکەم).[٦]

**٤ـ (وەلیدی کوڕی عوتبەی کوڕی أبی سفیان):**

کاتێك (مەڕوان)ی لێ لادا (معاویە) (وەلیدی کوڕی عوتبەی کوڕی أبی سفیان)ی کردە والی (مەدینە)،[٧] ئەمە لە ساڵی ٥٧ك یدا بوو.[٨]

---

١ المدينة في العصر الأموي (ص: ٧٣).

٢ سير أعلام النبلاء (٣/١٥٤).

٣ تذكرة الحفاظ ترجمة (ص: ١٣)، سير أعلام النبلاء (٣/١٥٤).

٤ تأريخ الطبري (٦/٨٧).

٥ تأريخ الطبري (٦/١٤٨).

٦ تأريخ الطبري (٦/٢١٠).

٧ المصدر نفسه (٦/٢٢٥).

٨ المصدر نفسه (٦/٢٢٥).

**کۆچی دوایی (أبو هريرة):** ساڵی ٥٨ك وتراویشە ٥٩ك لە شاری (مەدینە)دا (أبو هريرة) (ڕەزای خوای لێ بێت) کۆچی دوایی کرد، بە هۆکاری خزمەتی زۆری بۆ سوننەتی پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە لایەن دوژمنانی (سوننەت)ەوە ڕووبەڕووی هێرشێکی خەستو دڕندانە بۆتەوە، پێم گونجاوە لەسەری بدوێمو ئەو گومانانە بخەمەڕوو کە سەبارەت بە ئەو وروژێنراونو ڕوونی کەمەوە کە هەر هەموویان پوچەڵو هەڵبەستراون:

أ- ناساندنی: (عبدالرحمنی کوڕی صخری دوسی یەمانی)یە، لە سەردەمی جاهیلیدا ناوی (عبدشمس) بوو، پێغەمبەری خودا (ﷺ) ناوی لێنا (عبدالرحمن)و، بە نازناوی (أبو هريرة) ناوی دەرکردو، کار بەوە گەیشت بەسەر ناوەکەیدا زاڵ بێت خەریك بوو لە بیری بەرێتەوە، پرسیار لە (أبو هريرة) کرا: بۆ ئەم نازناوەت پێوە نوسا؟ -لە وەڵامدا- وتی: چونکە بێچوە پشیلەیەکم دۆزیەوەو خستمە باخەڵمەوە، جا پێم وترا: (أبو هريرة)، ئیدی ئەم ناوەم بەسەردا بڕا، ئەو کە مێردمناڵ بوو شوانی ڕانەمەڕی ماڵی خۆیان بوو، لەگەڵ بەچکە پشیلەکەی گەمەی دەکرد، بۆ خۆی دەیوت بە (أبو هريرة) بانگم مەکەن، چونکە پێغەمبەری (ﷺ) بە (أبا هِرّ) ناوی ناوم، نێر لە مێ باشترە.[1]

ب - ئیسلامبوونی: لە (یەمەن) لەسەر دەستی (طفیلی کوڕی عمرو) موسڵمان بوو، ساڵی ٧ك لە (یەمەن)ەوە کۆچی کردو لە یەکێك لە شەوەکانی فەتحی (خەیبەر)دا گەیشتە (مەدینە)و، نوێژی بەیانی لە دوای (سباعی کوڕی عرفطة)ەوە کرد-کە لە لایەن پێغەمبەری خوداوە (ﷺ)-و لە کاتی فەتحەکەدا بەسەر شاری (مەدینە)وە دانرابوو.[2]

ئیتر لەو کاتەوە پابەند بوو بە پێغەمبەری خودا (ﷺ)ەوەو، تا ئەو ڕۆژەی پێغەمبەر وەفاتی تێدا کرد، خۆی بۆ خزمەتکردنی تەرخانکردو، زانستی پیرۆزی لێ وەردەگرتو، هاتوچۆی لەگەڵ دەکردو لە خزمەتی دەچووە ماڵەوەو، لەو کاتانەدا کە لە ماڵ بوو و لە سەفەر بوو، لێی دانەدەبڕاو، هاوڕێی حەجو غەزاکانی بوو، ئیتر شەوو ڕۆژ کۆڵی لێنەدا تا زانستێکی زۆرو زەوەندو پوختو موبارەکی لێ وەرگرت، ماوەی چوار ساڵ هاوەلایەتی کرد، (صفة)ی کردە جێی حەوانەوەی و بە نانەسکی خزمەتی پێغەمبەری خودا (ﷺ)ی دەکرد،

---

١ سير أعلام النبلاء (٢/٤٢٤).

٢ المصدر نفسه (٢/٤٢٥).

پێغەمبەریش (ﷺ) کردبووی بە سەرکارو بەرپرسی (ئەهلی صوففە)، ئەویش لە هەموو کەس بە پلەوپایەیان شارەزاتر بوو.[١]

ت ـ بانگەشەکردنی دایکی بۆ موسڵمان بوون:

(أبو هريرة) (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: دایکم بتپەرست بوو، بەردەوام داوام لێدەکرد موسڵمان بێت، ڕۆژێك ئەم داوایەم ئاراستە کردەوە، لە وەڵامدا قسەیەکی نەشیاوی سەبارەت بە پێغەمبەری خودا (ﷺ) خستە بەر گوێم، بە گریانەوە هاتمە خزمەت پێغەمبەری خودا (ﷺ)، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا من دایکم بانگ دەکرد بۆ ئیسلام بوون‌و ئەویش بە گوێی نەدەکردم، ئیمڕۆ داوای موسڵمان بوونم لێکرد، لە وەڵامدا قسەیەکی نەشیاوی سەبارەت بە تۆ بەگوێ دادام، جا لە خودا بپاڕێوە دایکی (أبو هريرة) هیدایەت بدات، پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: ((أللهم اهد أم أبي هريرة)) خودایە دایکی ئەبی هورەیرە هیدایەت بدە، خێرا دەرچووم تا موژدەی پێ بدەم کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بۆی پاڕاوەتەوە، کاتێك لە دەرگای ماڵ نزیك بوومەوە بینیم داخراوە، دایکم گوێی لە خشپەی پێم بوو وتی: (ئەبو هورەیرە) لە جێی خۆت بوەستە، گوێم لە شڵپەشڵپی ئاو بوو، وتی: جا خۆی شوشت‌و پۆشاکەکەی لەبەر کردەوەو دەرگای کردەوە، ئینجا وتی: ئەبو هورەیرە!، (أشهد أن لا إله إلاّ الله وأشهد أن محمداً عبده ورسوله)، (أبو هريرة) وتی: جا لە خۆشیان بە گریانەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خودا (ﷺ) گەڕامەوەو وتم: ئەی پێغەمبەری خودا مژدە! خودا داواکەتی قبوڵ کردو هیدایەتی دایکی (أبو هريرة)ی دا، جا سوپاس‌و ستایشی خودای کردو فەرمووی: ((خيراً) زۆر زۆر باشە، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا داوا لە خودا بکە بە لای بەندە ئیماندارەکانیەوە خۆشەویستمان بکات‌و ئەوانیش بە لای ئێمەوە خۆشەویست بکات، جا پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: ((أللهم حبِّب عُبَيْدك هذا (يعني أبا هريرة) وأمه الى عبادك المؤمنين، وحبب إليهم المؤمنين)) واتە: خودایە ئەم بەندە بچووکەت (کە ئەبو هورەیرەیە)و دایکی بە لای بەندە ئیماندارەکانتەوە خۆشەویست بکە، ئیماندارانیش بە لای ئەوانەوە خۆشەویست بکە، ئیدی لەو کاتەوە هەر ئیماندارێك ناوی منی بیستبێت‌و بمبینێت خۆشی دەوێم.[٢]

---

١ حلية الأولياء (١/٣٧٦)، السنة قبل التدوين، محمد عجاج للخطيب (ص: ٤١٢٩).

٢ مسلم، رقم ٢٤٩١/ بر الوالدين، أم حفص الشويجي (ص: ٣٥).

ث- خوداپەرستی (أبو هريرة)و خێزانەكەی:

(أبو هريرة) پیاوێكی خۆپارێز بوو، پابەند بوو بە سوننەتی پێغەمبەری خودا (ﷺ)ەوە، خەڵكی هۆشیار دەكردەوە كە خۆیان لە ئارەزووكانی دونیادا نوقم نەكەن‌و، فەرمانی بە چاكە دەكردو ڕێگری لە خراپە دەكردو، لەم بوارەدا جیاوازی نەدەخستە نێوان (دەوڵەمەندو هەژار) یان (پاشاو گەدا)وەو -سەبارەت بە ئەمە هەواڵی زۆر هەن-، بە نهێنی‌و بە ئاشكرا زۆر لە خودا دەترساو، گەورەیی خودای بە بیر خەڵكی دەهێنایەوەو، هانی دەدان گوێڕایەڵ‌و فەرمانبەرداری ئەو زاتە بن،[1] خودا پەرست بوو، ڕۆژ بە ڕۆژو دەبوو و شەو (شەونوێژ)ی دەكردو، شەوی بە نۆبە لە نێوان خۆی‌و هاوسەرەكەی‌و كیژەكەیدا زیندوو ڕادەگرت‌و،[2] بایەخی بە ماڵەكەی خۆی دەداو دەیەویست بە خوداپەرستی ئاوەدانی بكاتەوە، (أبو عثمان النهري) دەڵێ: ماوەی حەوت (شەوو ڕۆژ) میوانی (أبو هريرة) بووم، خۆی‌و هاوسەرو خزمەتكارەكەی شەویان لە نێوان خۆیاندا دابەش كردبوو، یەكێكیان دەستی بە شەونوێژ دەكرد ئەمجا ئەوی بە خەبەر دەهێناو، ئەمیش شەونوێژی دەكردو ئەمجا ئەوی تریانی بە خەبەر دەهێنا.[3]

ماڵەكەی (أبو هريرة) ڕووناك‌و پڕشنگدار بوو، دەری دەخا كە ماڵی موسڵمانانی ئەو سەردەمە چۆن بوون، ماڵێكی ئاوەدان‌و زیندوو بە درێژایی شەوگار بە شەونوێژ، جا چۆن شەیتانەكان لەو ماڵەدا گۆشەیەكیان دەست دەكەوێت؟ ئەمە پەروەردەیەكی باڵا بوو لەسەر تەقواو كردەوەی چاك لە لایەن (أبو هريرة)ی فەرموودە لەبەرو زانای خودادۆستەوەو، وەڵامدانەوەو بە پیرەوەچوونێكی بەڕێزانە بوو لە لایەن ژنێكی پاكیزەو خزمەتكارێكی ساڵحی گوێڕایەڵەوە، كاتێك خەڵكانی دونیایی كارێكی گەورەو گرنگ بە خزمەتكارەكانیان دەسپێرن، بێگومان كارەكانی دونیایان دەخەنە ئەستۆو، پێیان وایە ئەگەر كارێكی قیامەتیان پێ بسپێرن هیچ بەرژەوەندیەكی ئەوانی تێدا نیە، بەڵام خەڵكانی قیامەتویست، كاتێك دەبینن خزمەتكارەكانیان بە كارێكی قیامەتەوە سەرگەرمن، ئەوپەڕی دڵخۆش دەبن، چونكە لەسەر پەروەردەكردن‌و ئامۆژگاریكردنیان پاداشتیان دەست دەكەوێت.[4]

---

١ سير أعلام النبلاء (٤٣٨/٢).

٢ البداية والنهاية (٣٧٨/١١).

٣ سير أعلام النبلاء (٦٠٩/٢).

٤ التأريخ الاسلامي (٢١٥/١٩) للحميدي.

ج ـ هەژاریو بە خۆ شەرمیەکەی:

(أبو هريرة) یەکێك بوو لە کەسە دیارە هەژارو نەدارەکان لەسەر نەداری ئارامی دەگرتو، جار هەبوو لە برسان بەردی لە سکی دەبەستو، بەبێ ئەوەی قوتێکی دەستکەوێتو پشتی پێ راست بکاتەوە شەوو ڕۆژی بەڕێ دەکرد،[1] (سەعیدی کوڕی موسەییەب) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: (أبو هريرة)م بینیوە دەورێکی بازاڕی دەداو، ئەمجا دەهاتەوە ماڵو دەیوت: هیچتان لە لایە؟ ئەگەر بیانوتایە: نەخێر، دەیوت: کەواتە نێتمە بەڕۆژووم.[2] بە قەناعەت بوو، بەو بەشە ڕازی بوو کە خودا پێی دابوو،ئەگەر (١٥) پازدە دەنکی خورما پێ بوونایە، بەریانگی بە پێنج دەنك دەکردەوەو، پارشێوی بە پێنجی دووەم دەکردو، پێنجەکەی تریشی بۆ بەربانگ دەهێشتنەوە.[3] شوکرانەبژێر بوو، ئەگەر نیعمەتێکی لە لایەن خودا پێ دەدرا زۆری (سبحان الله، الحمد لله، الله أكبر) دەکرد.[4]

ح ـ نەرمونیانیو لێبوردنەکەی:

(ئەبو هورەیرە) کەنیزەکێکی (زنجی= قولەڕەش)ی هەبوو بە ڕەفتارەکانی پەشۆکابوون، ڕۆژێکیان قەمچیەکەی لێ ڕاست کردەوەو ئەمجا وتی: ئەگەر نەمزانیبایە لە قیامەت تۆڵەم لێ دەکرێتەوە هێندەم لێ دەدای تا دەمبوراندیەوە، بەڵام بە کەسێکت دەفرۆشم نرخەکەتم بە تەواوەتی دەداتێو زۆریش پێویستم پێیەتی، بڕۆ لەبەر خاتری خودای بە دەسەڵات ئازاد بە.[5] بەم جۆرە (أبو هريرة) (ڕەزای خوای لێ بێت) دێ دەسەڵاتی خۆی لە ئاست ئەو کۆیلە کارەکەرە لە بەرانبەر دەسەڵاتی خودا لە ئاست خۆیدا ڕادەنوێنێتو هەڵی دەسەنگێنێت، ئینجا دێ خۆپاراستن لە توڕەییو سزای خودا بەسەر جێبەجێکردنی توڕەییو سزای خۆیدا هەڵدەبژێرێتو، دەرەنجام خۆ لە سزادانی کۆیلە کارەکەرەکەی دەبوێرێتو لە باتی لێدان چاکەی لەگەڵ دەکاتو، لەبەر خاتری خودا لە بەندایەتی ئازادی دەکات، بەم شێوازەو لە یەك کاتدا ژمارەیەك کردەوەی چاكو جوانی کۆکردنەوە: (ترسان لە خودای بەرزو باڵاو، لێبوردن لە خراپەکارو چاکە لەگەڵ کردنی)، لێرەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێ بێت) چەند بە قوڵی بیریان لە ژیانی قیامەت کردۆتەوەو چۆن لە هەموو

---

١ السنة قبل التدوين (ص: ٤١٣).

٢ حلية الاولياء (٣/٣٨١).

٣ البداية والنهاية (١١/٣٨٥).

٤ تأريخ الاسلام (٢/٣٣٥)، سير أعلام النبلاء (٢/٤٣٩، ٤٤٠).

٥ البداية والنهاية (١١/٣٨٥).

کات‌و شوێن‌و هەڵسوکەوتێکدا خودایان بە چاودێری خۆیان داناوەو، لە پێناو گەیشتن بە ڕەزامەندی خودا هەوڵ‌و تەقالای بێ پسانەوەیان داوە.[1]

خ- بەڕێوەبردنی کاروباری (بەحرەین) لەسەردەمی (عمر) (ڕەزای خوای لێ بێت)دا:

پێغەمبەری خودا (ﷺ) (أبو هريرة)ی لەگەڵ (عەلائی خەزرەمی) ناردە (بەحرەین) تا ئیسلام بڵاوبکاتەوەو موسڵمانان شارەزا بکات‌و فێری ئەنجامدانی کاروباری دینەکەیان بکات، جا فەرموودەی لە پێغەمبەری خودا (ﷺ)ەوە دەگێڕانەوەو فتوای بۆ خەڵکی ئەوێ دەدا، (عمر) (ڕەزای خوای لێ بێت) لە سەردەمی خۆیدا کردی بە والی (بەحرەین)، کە هاتەوە (مەدینە) دە هەزاری لەگەڵ خۆی هێنابۆوە، (عمر) پێی وت: ئەی دوژمنی خوداو دوژمنی قورئان! ئەو سامانەت -بۆ بۆ خۆت پاشقولداوە؟-(أبو هريرة) وتی: نە دوژمنی خودام‌و نە دوژمنی کتێبی خودام، بەڵکو دوژمنی ئەو کەسەم دوژمنایەتیان دەکات، (عمر) وتی: ئەی ئەمەت لە کوێ بووە؟ لە وەڵامدا وتی: بەرهەمی زاووزێی ماین‌و هەقدەستی کۆیلەیەکم‌و پاشەکەوتی ئەو موچەیەیە کە لەسەر یەك پێم دراوە، کە لێیان کۆڵیەوە چی وتبوو ئاوا بوو.[2]

ئەمەو (عمر) (ڕەزای خوای لێ بێت) لەگەڵ ژمارەیەك کاربەڕێوەبەری تریدا سوێندی دا، (أبو هريرة) دەیوت: خودایە لە ئەمیری ئیمانداران خۆش بە،[3] دوای ئەمە (عمر) بانگی کردو پێی وت کە بە نیازە کاری پێ بسپێرێت، بەڵام نەیەویست، (عمر) وتی: ڕقت لە کاربەڕێوەبردن دەبێتەوە کە لە کاتێکدا کەسێکی وەکو (یوسف) (سەلامی خوای لێ بێت) زۆر لە تۆش باشتر بووەو داوای کردووە؟ (أبو هريرة) وتی: (یوسف) کوڕی پێغەمبەری کوڕی پێغەمبەری کوڕی پێغەمبەر بووە، بەڵام من (أبو هريرة)ی کوڕی (ئەمیمە)م، من لە سێ‌و دووی کارەکەتان دەترسم، (عمر) وتی: ئەوە بۆ نەتوت (پێنج)؟ (أبو هريرة) وتی: نا لەم (۳و ۲)انە دەترسم، دەترسم قسەیەکم بەسەر زاردا بێت‌و زانیاریم لەسەری نەبێت‌و دادوەرییەك بەبێ ئاوەزی ئەنجام بدەم‌و پشتم دارکاری بکرێت‌و ماڵم لێ بسێنرێت‌و جوێن بە شەرەف‌و ناموسم بوترێت.[4]

د- خۆبواردنی لە فیتنەو ئاشوب: لە ڕۆژی گەمارۆدانی ماڵەکەی (عوسمان) (ڕەزای خوای لێ بێت)دا، (أبو هريرة) لەگەڵ ژمارەیەك هاوەڵ بە خۆیان‌و کوڕەکانیانەوە لە لای (عوسمان)

---

١ التأريخ الاسلامي (٢٣/١٧) للحميدي.

٢ البداية والنهاية (٣٨٧/١١).

٣ طبقات بن سعد (٦٠/٤)، السنة قبل التدوين (ص: ٤١٦).

٤ سير أعلام النبلاء (٤٤١/٢)، السنة قبل التدوين (ص: ٤١٦).

بوون‌و دەیانەویست لە دەستی ئاژاوەچیەکان بیپارێزن، ئەمەو ڕۆڵەکانی (عوسمان) ئەم چاکەی (أبو هریرة)یان دەزانی، بۆیە ڕێزیان لێ دەگرت‌و تا ئەوەی کاتێك (أبو هریرة) وەفاتی کرد، هەتا گۆڕستانی (بەقیع)و شوێنی ناشتنی جەنازەکەیان بە شانی خۆیان هەڵگرتبوو.[1] ئەمەو (أبو هریرة) پاش شەهیدکرانی (عوسمان) (ڕەزای خوای لێ بێت) خۆی لە فیتنەو ئاشوب لادا.[2]

ر- خۆشمەشرەبی‌و گاڵتەو گەپی:

(أبو هریرة) (ڕەزای خوای لێ بێت) خۆشڕەفتارو نەفس پاك‌و بێ خەوش‌و سەرو ڕووخۆش بوو، حەزی بە گاڵتەوگەپ دەکرد، لەگەڵ ئەمەشدا بە هەر هەموو شتێك مافی تەواوی خۆی پێ دەدا، بە چاوی کاروانچی لە دونیای دەڕوانی‌و پۆستی ئیمارەت‌و ویلایەت بەرەو خۆبەزلزانی پەلکێش نەکرد، بەڵکو خۆ بەکەمزانی‌و ڕەوشت جوانی ئەوی دەرخست (مەڕوانی کوڕی حەکەم) لە (مەدینە) کردبووی بە جێنشینی خۆی، جار هەبوو سواری گوێدرێژێك دەبوو کورتانەکەی لێ توند کردبوو ڕێشمەیەکی لەسەر هاڵاندبوو کە بە خەڵك دەگەیشت دەیووت: ڕێگا چۆڵ کەن جەنابی ئەمیر هات.[3] (أبو هریرة) کە لە سەردەمی (مەڕوان)دا والی (مەدینە) بوو بە کۆڵە دارەوە بە بازاڕدا تێدەپەڕی‌و بە (أبي ثعلبةی کوڕی أبی مالکی قورەزی) دەوت: هۆ (کوڕی مالیك) ڕێ بۆ ئەمیر فراوان بکە، دەیووت: ڕەحمەتی خوات لێ بێت ئەوەندە بەسە ! !، جا (أبو هریرة) دەیووت: ڕێ بۆ ئەمیر چۆڵکە بارەداری لەسەر پشتە.[4]

حەزی دەکرد خۆشی بخاتە دڵ‌و دەروونی منداڵانەوە، کاتێك شەوانە دەیبینین خەریکی گەمەن نەیدەهێشت هەست پێ بکەن‌و لە نکاو خۆی هەڵدەدایە نێویانەوەو وەکو شێت بە قاچەکانی تەپەی لە زەوی دەهێنا، منداڵەکانی دەترساندو هەڵدەهاتن‌و[5] لێرەو لەوێ بە یەکتر پێدەکەنین.[6]

١ الکامل في التأریخ (٢/٥٢٣).
٢ السنة قبل التدوین (ص: ٤١٧).
٣ طبقات إبن سعد، نقلا عن السنة قبل التدوین (ص: ٤١٨).
٤ البدایة والنهایة (١١/٣٨٦).
٥ البدایة والنهایة (١١/٣٨٨).
٦ البدایة والنهایة (١١/٣٨٨) في الحاشیة.

(أبو رافع) دەڵێت: جار هەبوو (أبو هریرة) بۆ خواردنی ئێوارە لەگەڵ خۆی دەبردمە ماڵەوە، جا دەیوت: گوڵمە گۆشتەکان بۆ ئەمیر بەجێ بێڵن، کە تەماشای خواردنەکەمان دەکرد دەبینین تەنها تریت‌و تێکوشاوەو ڕۆنی بەسەردا کراوە.[1]

زـ ژیانی زانستیانە:

(أبو هریرة) (ڕەزای خوای لێ بێت) چوار ساڵ هاوەڵایەتی پێغەمبەری خودا (ﷺ)ی کرد، زۆری لێ بیست‌و شایەدی وردەکاریەکانی سوننەت بوو، لە شێوەی چەسپاندنی شەریعەت تێگەیشت، خەم‌و خۆراکی زانست بوو، خولیای تێگەیشتن لە دین بوو،[2] دەرخکردنی فەرموودەکان لە لایەن ئەوەوە یەکێکە لە موعجیزە لە عادەتبەدەرەکانی پێغەمبەرێتی،[3] (أبو هریرة) دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: ((ألا تسألني من الغنائم التي يسألني أصحابك؟)) واتە: ئەوە بۆ لەو دەستکەوتانەم لێ داوا ناکەی کە هاوڕێکانت داوامی لێ دەکەن؟ وتم: داوات لێ دەکەم لەو زانستەم فێرکەی کە خودا فێری کردویت، جا ئەو فەرەجیەی لێ داکەندم کە لەبەرم بوو لە نێوان خۆم‌و خۆیدا ڕایخست، تا ئەوەی تەماشام دەکرد مێروولە بەسەریدا دەڕۆیشت، جا قسەی بۆ کردم تا بە تێرو تەواوی فەرموودەکانیم وەرگرتن، فەرمووی: ((إجعلها فصُرها إليك)) واتە: کۆی بکەوەو لەبەر خۆتی بکەوە، جا لەو کاتەوە پیتێکم لە فەرموودەکانی لەبیر نەکردووە،[4] بۆ خۆی دەیوت: ئێوە دەڵێن: (أبو هریرة) فەرموودەی زۆری پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەگێڕێتەوەو دەشڵێن: بۆ کۆچەران‌و پشتیوانان وەکو ئەو فەرموودە ناگێڕنەوە؟ لە ڕاستیدا برا کۆچەریەکانم بە مامەڵەی بازاڕەوە سەرگەرم دەبوون، برا (پشتیوان)ەکانیشم کاروباری ماڵی خۆیان سەرقاڵی دەکردن، منیش لە ڕیزی هەژارەکانی (صوففە) بووم‌و نەدار بووم، بە نانەسکی خزمەتی پێغەمبەری خودا (ﷺ)م دەکرد، کە ئەوان دیار نەدەمان من هەر لە خزمەتیدا ئامادە بووم، کە ئەوان فەرموودەکانیان لەبیر دەچوونەوە، من دەهاتم دەرخم دەکردن، ڕۆژێکیان پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە وتارێکیدا فەرمووی: ((إنه لن يبسط أحد ثوبه حتى أقضي جميع مقالتي، ثمَّ يجمع إليه ثوبه، إلا وعى ما أقول)) واتە: هەر کەسێك تا لە تێکڕای وتارەکەم تەواو دەبم‌و کراسەکەی ڕاخات‌و ئینجا کۆی بکاتەوەو لەبەر خۆی بکاتەوە، هەرچی وتوومە دەرخی

١ البداية والنهاية (١١/٣٨٨).

٢ السنة قبل التدوين (ص: ٤٢٠).

٣ سير أعلام النبلاء (٢/٥٩٤).

٤ سير أعلام النبلاء (٢/٥٩٤)، رجاله ثقات.

دەکات، جا منیش قوڵە باڵەکەی بەرم ڕاخست، لێی گەڕام تا لە وتارەکەی تەواو بوو، کۆم کردەوەو لەسەر سنگم دانا، ئیدی یەك تۆزم لەم وتارەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) لەبیر نەچۆوە،[١] بەپێی ڕیوایەتێکی تر: ڕۆژێك وتاری بۆ داینو فەرمووی: ((من يبسط ثوبه حتى أقضي مقالتي ثم قبضه إليه، لم ينس شيئاً سمع مني أبداً)) واتە: هەر کەسێك تا کۆتایی بە وتارەکەم دێنم کراسەکەی ڕاخا، ئینجا بە سینگی خۆیەوە بنوسێنێت، تا هەتایە هەر وتەیەك لە من ببیستێت لە بیری ناچێتەوە. جا من ئەوەم کرد، سوێند بەو زاتەی ئەوی بە هەق ناردووە، یەك تۆز لەوەی لە ئەوم بیستووە لە بیرم نەچۆتەوە.[٢]

(أبو هريرة) دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ)، سەبارەت بە شەفاعەتت کێ لە هەموو کەس شایانترە؟ فەرمووی: ((لقد ظننت يا أبا هريرة لا يسألني عن هذا الحديث أحد أول منك، لما رأيت من حرصك على الحديث، إن أسعد الناس بشفاعتي يوم القيامة من قال: (لا إلهَ إلاّ الله) خالصاً من نفسه))[٣] واتە: ئەی ئەبا هورەیرە! بە بڕوای خۆمو بە حوکمی داکۆکیکردنت لەسەر (فەرموودە)، پێم وابوو کەس سەبارەت بەم شتە پێش تۆ ناداتەوەو پرسیارم لێ ناکات، بەختیاترین کەس بە هۆی شەفاعەتی منەوە لە قیامەتدا ئەو کەسەیە: بەوپەڕی دڵسۆزیو پاكو پوختی وتبێتی: (لا إلهَ إلاّ الله).

ئیتر (أبو هريرة) لەبەرکەرو دەرخەرو پارێزەری فەرموودەکان بوو، بەوپەڕی وردەکاریو ڕێکوپێکی دەیگێڕانەوە، دوو سیفەتی گەورەی تێدابوون کە هەردووکیان تەواوکەری یەکتر بوون، یەکەم: زانستێکی بەرفرەو زۆری ڕیوایەتکردن، دووەم: مێشکێکی بەهێزو جوان دەرخکردن، ئەمە ئامانجێکە هەموو زانایەك ئاواتی بۆ دەخوازێت.[٤]

(أبو الزعيزعة)ی کاتیبی (مەڕوان) شتێکمان بۆ باس دەکات، کە ڕێکوپێك دەرخکردنو جوانپاراستنی فەرموودەکان لە لایەن (أبو هريرة)ەوە دەسەلمێنێتو دەڵێت: (مەڕوان) بانگی (أبو هريرة)ی کردو لە پرسیارانی گرتو منیشی لە پشت باڵنجەکەوە دانیشاند، ئەوەی دەیوت دەمنوسیەوە، ساڵێك بەسەر ئەمەدا تێپەڕی، دووبارە (مەڕوان) بانگی

---

١ مسلم، رقم (٢٤٩٢).

٢ سير أعلام النبلاء (٢/٤٩٥)، مسلم، رقم (٢٤٩٤).

٣ سير أعلام النبلاء (٢/٥٩٦)، اسناده صحيح.

٤ السنة قبل التدوين (ص: ٤٢٧).

کردەوە، لە پشت پەردەوە دانیشاندەوەو سەبارەت بە نووسراوەکە پرسیاری لێکردەوە، بەبێ زیادو کەمو پێشخستنو دواخستن هەر هەمووی وتەوە.[١]

(أبو هريرة) بەس ڕیوایەتکەری فەرموودە نەبوو، بەڵکو یەکێك بوو لە سەرانی زانستخوازی بواری (قورئانو سوننەتو ئیجتیهاد)ی سەردەمی خۆی، هاوەڵایەتیکردنو پابەندبوونی بەردەوامی ئەو بە پێغەمبەری خودا (ﷺ)ەوە دەرفەتی دایە لە (دین) شارەزا بێتو شایەدی سوننەتی کرداری بێتو وردو درشتەکانی بە چاوی خۆی ببینێتو دەرەنجام ببێتە خاوەن بەرهەمێکی زۆرو زەوەندی فەرموودەی پیرۆزو هەموو ئەمانە (أبو هريرة)یان سازکرد تا ماوەی بیستو ئەوەندە ساڵ فتوای بۆ موسڵمانان دەدا، ئەمە لە کاتێکدا هاوەڵانێکی زۆر لەو سەردەمەدا هەبوون.[٢]

- ڕاسترین گێڕانەوەی فەرموودەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە ڕێی (أبو هريرة)ەوە:

لە (إبن المدني)یەوە حیکایەت کراوە کە وتوویەتی: لە صەحیحترین زنجیرەی گێڕانەوە بە ڕەهایی: (حمادی کوڕی یەزید) لە (أيوب)ەوە لە (محمدی کوڕی سيرين)ەوە لە (أبي هريرة)ەوە.[٣]

هەروەها صەحیحترین فەرموودە کە لە (أبو هريرة)ەوە ڕیوایەتکراوە لەم ڕێگایانەوە هاتوون:

... (الزهري) لە (سعیدی کوڕی المسيب) لە (أبي هريرة).

... (أبو الزناد) لە (ألأعلاج) (عبدالرحمن کوڕی هرمز) لە (أبي هريرة).

... (مالك) لە (الزهري) لە (سعیدی کوڕی المسيب) لە (أبي هريرة).

... (سفيان کوڕی عيينة) لە (الزهري) لە (إبن المسيب) لە (أبي هريرة).

... (معمر) لە (الزهري) لە (إبن المسيب) لە (أبي هريرة).

... (معمر) لە (همام کوڕی منبه) لە (أبي هريرة).[٤]

*** بەرپەرچدانەوەی ئەو گومانانەی سەبارەت بە (أبي هريرة) (ڕەزای خوای لێ بێت) وروژێنراون:** لە کۆندا خەڵکانێکی سەر بە تاقمە هەواییەکان هاتوون تیرو توانجگەلێکیان لەسەر (أبي هريرة) نوسیوەو، لەم سەردەمەشدا ژمارەیەك خۆرهەڵاتناسی وەك (جولد

---

١ سير أعلام النبلاء (٢/٥٩٨).

٢ السنة قبل التدوين (ص: ٤٢٨).

٣ المصدر نفسه (ص: ٤٤٣).

٤ المصدر نفسه (ص: ٤٣٥).

تــسهیر)و (شــبرنجر) هــەمان بوختــانو توانجیــان لەســەر ئــەو زاتــە کاوێــژ کردوونەتــەوە، (عبدالحسین شرف الدین العاملي) شیعە مەزەب کتێبێکی بە ناونیشانی (أبو هريرة) نوسیوەو تێیـدا بوختانگـەلێکی زۆری لـە دژ ئـەو هەڵبەسـتوە، کـە هـیچ لەگـەڵ ئـەو نایەتـەوەو لـە بەرانبەریدا نێوچاوانی زانست ئارەق دەردەکاتو ویژدانی زانایـان سـەر دادەنـەوێنێتو هـەق ئازاری پێ دەگات، تا دەرەنجام (أبو هريرة) تـەکفیر دەکـاتو لـە بازنـەی ئیمـانو ئیـسلامی دەردەکــات.[1] (أبوريــة)ی خــاوەنی کتێبــی (أضــواء علــی الــسنة المحمديــة) لــەو کتێبــە هەڵـدەگۆزێتو دەرهــەق بــە (أبـي هريـرة) زۆر زۆر لـە مامۆسـتاکەی سـەرلێ شـێواوو تونـدو تیژترە، گرنگترین گومان کە لە دەورەی (أبو هريرة)ەوە وروژێنراون ئەمانەن:

أ- (عمر و أبو هريرة) (ڕەزای خوایان لێ بێت):

(عبدالحسين شرف الدين)و (أبوريـة)[2] بـە جوتـە (أبـو هريـرة) بـە دزینـی دە هـەزار دینـار تۆمەتبار دەکەن کاتێك (عمـر) کردبـووی بـە والی (بـەحرەین)، جـا (عمـر) دارکـاری کـرد تـا بریندار بوو.

لـە ڕاسـتیدا هـەموو ڕیوایەتـە باوەڕپێکراوەکـان دەڵـێن: (عمـر) (خـوای لێـی ڕازی بێـت) هـەروەکو چـەند والیـەکی تـر سـەروەتو سـامانەکەی ئەویـشی دابـەش کـردو،[3] ئـیتر باسـی ئەوەیان نەکردووە کـە لێـی دابێـتو برینـداری کردبێـت، (أبـو هريـرة) دەیـووت: خودایـە لـە ئەمیری ئیمانداران خۆش ببیو، لەگەڵ ئەوەشدا دەیزانی کە سامانە دابەشکراوەکەی موچەو بەشـی تایبـەتی خـۆیو بەرهـەمی کۆیلـەکانی بـووە، بـەڵام ڕقـی لـە (عمـر) دانـەگرتو دڵو دەروونی پڕ نەکرد لە خەشمو قین، خۆ ئەگەر (عمر) تۆزقاڵێك گومانی لەسەر ئەمینداری (أبو هريرة) بۆ پەیدا بوایە ئەوا حوکمی دەداو سزای شەرعی بەسـەردا دەسـەپاند، بـەڵام چـونکە دەیزانی ئەمیندارو دڵسۆزە پاش کەمێك دەگەڕێتەوە لایو پێـشنیاری پۆسـتی ویلایـەتی بـۆ دەکاتەوە، بەڵام وەك لە پێشدا باسمان کرد (أبو هريـرة) قبـوڵی نـەکرد، ئەمـە ڕووی ڕاسـتی ڕووداوەکە بوو کە (عبدالحسين)و (أبورية) ویـستوویانە بیـشارنەوە، هەرچـی (عبدالحسين)ە تاکە ڕیوایەتێکی لە (عقد الفريد)ی (إبن عبد ربه)ەوە هێناوە،[4] چونکە لەگەڵ ئـارەزووی ئـەو هاتۆتــەوە، (أبوريــة)ش بــەبێ ئامــاژەدان بــە سەرچــاوەو لێکۆڵینــەوەو بــەراوردکردنو لــە

---

١ المصدر نفسه (ص: ٤٣٧).

٢ أبو هريرة لعبد الحسين (ص: ١٤، ١٥)، أضواء على السنة المحمدية (ص: ١٩٢).

٣ تأريخ الاسلام (٢/٣٣٨)، حلية الأدلياء (١/٣٨٠)، البداية والنهاية (١١/٣٨٧).

٤ السنة قبل التدوين (ص: ٤٣٨).

بێژینگدان هەمان ڕیوایەتی لە کتێبەکەی (عبدالحسین)ەوە گواستۆتەوە،[1] ئەمە بەڵگەیە لەسەر سوربوونیان لەسەر ساختەکاریو دەست وەشاندنیان لە ئەمانەتی زانستی.

ب ـ ئایا (أبو هريرة) لایەنگری (ئومەوی)یەکانی کردووە؟ سەبارەت بە زەمبکردنی (علی)و ڕۆڵەکانی (فەرموودە)ی داناون؟

(عبدالحسين) تاوانباری دەکاتو دەڵێت کە جارچی ئومەویەکان بووەو بە گوێرەی داخوازی سیاسەتی ئەوان ڕەفتاری نواندووەو، دەمێك فەرموودەی لە پەسندکردنی ئەواندا هەڵدەبەستن، دەمێکی تریش بە پێی حەزی (معاویە)و تاقمە یاخیەکەی فەرموودەی لە پەسندکردنی دوو خەلیفەکاندا بەسەریەکدا دەدان.[2] (أبوریة) لەم بابەتەداو سەبارەت بە (أبو هريرة) هەر هەموو جنێوو قسە دزێوو نەشیاوەکانی نێو کتێبەکانی (شیعە)ی کۆکردوونەتەوەو درۆو دەلەسەو بوختانگەلێك کە دەرهەق بە هاوەڵانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) هەڵبەستراون هێناونیو لەم بوارەدا پشتی بە کتێبگەلێك بەستووە کە دانەرەکانیان لە ڕیوایەتکردندا بە ڕاستگۆییو کارپوختی نەناسراون، یان نوسەرەکانیان بە دوژمنی بابەکوشتەی (أبي هريرة) ناسراون، بە بیروبڕوای ئێمە ئالوبەیتی پێغەمبەری خودا (ﷺ) خۆشەویستی (أبو هريرة) بوونو ئەو بەچاوی خۆشەویستیەوە تەماشای دەکردنو سەبارەت بە جوامێریو پەسندی (حسنو حسين) چەند فەرموودەیەکی ڕیوایەتکردوونو،[3] هەرگیز بە چاوی دوژمنکارانەوە بۆ ئالوبەیتی نەڕوانیوەو، بەوە بەناوبانگ بووە کە دەستی بە سوننەتی پێغەمبەری خودا (ﷺ)ەوە گرتووەو، هەموو ئەو کەسانەی خۆش دەویستن کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) خۆشی دەویستن، سەیرە کەسێك کەمێك لە زانستی پێ بێتو پڕوپاگەندە بۆ (أبو هريرة) بکاتو بڵێ: (أبو هريرة) ڕقی لە (عەلی)و خانەوادەکەی (ڕەزای خوایان لێ بێت) بۆتەوە.[4]

مامۆستا (عبدالمنعم صالح العزي) کتێبێکی بە نرخی سەبارەت بە (بەرگریکردن لە أبو هريرة) نوسیوەو ڕوونی کردۆتەوە کە ئەو چەندە (علي وفاطمة) (ڕەزای خوایان لێ بێت)ی خۆشویستوونو دەری خستووە کە (أبو هريرة) ڕیوایەتەکەی ڕۆژی جەنگی (خەیبەر) سەبارەت بە پەسندی (عەلی) دەگێڕێتەوە: لە (أبي هريرة)وە (ڕەزای خوای لێ بێت):

---

١ المصدر نفسه (ص: ٤٣٩).

٢ أبو هريرة لعبد الحسين (ص: ٣٥).

٣ السنة ومكانتها في التشريع الاسلامي (ص: ٣٥٣، ٣٥٤).

٤ البرهان في تبرئة أبي هريرة من البهتان (ص: ١٤٧).

پێغەمبەری خودا (ﷺ) ڕۆژی غەزای (خەیبەر) فەرمووی: ((لأعطينَّ هذه الرّاية رجلاً يحب الله ورسوله يفتح الله على يديه)) واتە: (بەیانی) ئەم ئاڵایە دەدەم بە پیاوێك كە خوداو پێغەمبەری خودای (ﷺ) خۆش دەوێن، خودا لەسەر دەستی ئەو سەركەوتن دێنێتە پێشەوە، ئینجا دەگێڕێتەوە كە سبەینێ ئاڵاكەی دا بە (عەلی)،[1] ئایا پێ دەچێت گێڕەرەوەی ئەم ڕیوایەتە (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران (ڕەزای خوای لێ بێت)ی خۆش نەویستبێت؟ یان ڕقی لێ بووبێتەوە؟ سەبارەت بە سیفەتە پەسندو ڕەندەكانی (فاطمة)ش (ڕەزای خوای لێ بێت) (أبو هريرة) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: ((إن فاطمة سيدة نساء أمتي))[2] واتە: (فاتیمە) خانمو گەورەی ژنانی ئوممەتمە، بەڵێ هەر (أبو هريرة) ژمارەیەك فەرموودەی لەسەر خۆشویسترانی (حسێنی كوڕی عەلی) گێڕاونەتەوەو، چەند ڕووداوو بیرەوەریەكی خۆیشی دەری دەخەن كە پڕ بە دڵ حەسەنی خۆش ویستووە،[3] ئەمەو لە گێڕانەوەیەكیدا وێنەیەك لە خۆشەویستی خۆیمان لە بەرانبەر (حسن) (ڕەزای خوای لێ بێت) لەگەڵ پێغەمبەری خودا (ﷺ) نیشان دەداتو دەڵێت: لەو كاتەوە ئەو پیاوەم بە بەردەوامی خۆش دەوێت، كە بینیم پێغەمبەری خودا (ﷺ) دانیشتووەو ئەویش پەنجەكانی دەخستە نێو ڕیشی پێغەمبەر (ﷺ)ەوەو، پێغەمبەریش زمانی دەخستە نێو دەمیەوەو ئەمجا فەرمووی: ((أللهم إني أحبه فأحبَّه))[4] واتە: خودایە! من خۆشم دەوێتو تۆش خۆشت بوێت، كەواتە دوای هەبوونی ئەم هەموو خۆشەویستیە هیچ سەیر نیە لە ڕۆژی وەفاتی (حەسەن)دا (أبو هريرة) یەكبەخۆ بگریەتو بانگی خەڵكیش بكات تا بگرین.[5] شایەتحاڵێك دەڵێت: لەو ڕۆژەدا كە (حەسەن) كۆچی دوایی كرد (أبو هريرة)م لە مزگەوت بینی بە پێوە ڕاوەستابوو و دەگریا، بە دەنگی بەرز بانگی دەكرد: ئەی خەڵكینە: ئیمڕۆ خۆشەویستی ڕەسوڵی خودا (ﷺ) كۆچی كردووە، دە جا بگرین.[6]

خۆ خۆشەویستی (أبو هريرة) بۆ (حوسەین) لە خۆشەویستی ئەو بۆ (حەسەن) كەمتر دەرنەكەوتووە، ڕووداوێكی تری پێغەمبەر (ﷺ)مان بۆ باس دەكاتو دەڵێت: هەر كاتێك

---

١ مسلم.

٢ الادلة الباهرة على نفي البغضاء بين الصحابة والعترة الطاهرة (ص: ١٣٣).

٣ التأريخ الكبير للبخاري (١/٢٣٢)، بسند موصول.

٤ الادلة الباهرة (ص: ١٣٤).

٥ الادلة الباهرة (ص: ١٣٥).

٦ التهذيب (٢/٣٠١).

(حوسەینی کوڕی عەلی)م بینیبێت چاوم پڕ بوون لە فرمێسك بە خاتری ئەوە ڕۆژێك پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە ماڵ هاتە دەرەوەو، لە مزگەوت چاوی بە من کەوت، دەستی گرتم‌و تینی دامێ، لەگەڵی ڕۆیشتم تا هاتە بازاڕی (بەنی قەینقاع) نەیدواندم، خولێکی بە بازاڕەکەداو چاوێکی پێدا خشاند، ئینجا گەڕایەوەو منیش لەگەڵی گەڕامەوە، جا لە مزگەوت دانیشت‌و دەستەوئەژنۆ پاڵی دایەوە، بە منی فەرموو: ((أدع لي لكاع)) ئەو بچکۆلەم بۆ بانگ بکە، جا (حوسەین) بە توندی هات‌و خۆی هەڵدایە نێو کۆشیەوە، ئینجا دەستی خستە نێو ڕیشی پێغەمبەری خودا (ﷺ)ەوە، پێغەمبەری خوداش (ﷺ) دەمی حوسەینی کردەوەو دەمی خستە نێویەوەو فەرمووی: ((أللهم إني أحبّه فأحبَّه))[1] واتە: خودایە من خۆشم دەوێ، جا تۆش خۆشت بوێ، ئەو چیرۆکەی (بوخاری) گێڕاویەتیەوە (حەسەن)ی تێدا باس کراوە نەك (حوسەین)، بەڵام (حاکم) ئاماژەی بەوە داوە کە هەردووك ڕیوایەتەکە بە پارێزراوی‌و مەزبوتی هاتوون‌و، ئەمەش ڕێی تێ دەچێت، چونکە گەڕانەوە بۆ مزگەوتی تێدا باس کراوە.[2]

(عبدالمنعم العزي) لە کتێبی (أقباس من مناقب أبي هريرة)دا بە بەڵگەی تەواوو یەکلاکەرەوە سەرژمێری ڕۆڵەکانی (عەلی) (ڕەزای خوایان لێ بێت) بە ڕیوایەتی (أبي هريرة) سەلماندووەو، چەسپاندوویەتی کە ئەوانیش‌و سوراچاك‌و سوپاسالارەکانی (عەلی) –ئەوانەی لە جەنگی (صفین‌و نەهرەوان)دا بەشداربوون– لە زاری (أبو هريرة)ڕا فەرموودەیان ڕیوایەت کردوون، هەروەها سابتی کردووە کە جەماوەری (تابعین) ئەوانەی بە (عەلی) (ڕەزای خوای لێ بێت) گەیشتوون‌و ژمارەیەکی زۆری تر لە جەماوەری شیعەو کوفیەکان‌و هەوادارانی نەوەکانی (عەلی) لە چینی شوێنکەوتووانی (تابعین)و چینی دوای ئەوانیش فەرموودەیان لە (أبو هريرة)وە گێڕاونەوەو، ڕیوایەتەکانی ئەویان بەکارهێناون‌و بە بەڵگەیان هێناونەوەو لە کتێبەکانی خۆیاندا نوسیویاننەوە.[3]

حەقیقەتی مێژوو دەڵێ: بەڵگەیەك دەست ناکەوێت لایەنگری (أبو هريرة) لە (ئومەوی)یەکان، یان دوژمنایەتی ئەو بۆ (عەلی)و ڕۆڵەکانی بسەلمێنێت، بەڵکو ئەمە تەنها بوختان‌و ستەمێکەو دەرهەق بە (حەقیقەت) کراوە، ئەو ڕیوایەتانەش کە سەبارەت بە پێ

١ المستدرك (٣/١٧٨).
٢ الادلة الباهرة (ص: ١٣٤).
٣ أقباس من مناقب أبي هريرة، عبدالمنعم العزي (ص: ١٤٧ــ١٤٩).

داهـەڵگوتنی (ئومـەوی)یـەکان پاڵدراونەتـە لای (أبـي هریـرة) لاوازن‌و بـە دژی ئـەو هەڵبەستراون‌و شارەزایانی ئەم بوارە خەڵکانی درۆزن‌و حەدیس هەڵبەستیان ناساندوون.[١]

سەبارەت بەو پڕوپاگەندەیەش کە دەڵێت: دەوڵەتی ئومەوی بە خاتری دروستکردنی ڕای گشتی بـۆ خـۆی هەسـتا دەسـتی بـە (فـەرموودە) دانـان کـرد، ئـەم پڕوپاگەندەیـە تـەنها خـەیاڵپڵاوی درۆزنەکانـە، مێـژوو بـۆی نەگێڕاوینـەوە کـە حوکومـەتی ئومـەوی فـەرموودەی دانابن، ئێمە پرسیار دەکەین: کێ ئەمەی وت؟ ئەو فەرموودانە کوان کە ئەو حکومەتە هـەڵی بەستوون؟ زانایانمان وا ڕاهاتوون کە هیچ (فـەرموودە)یـەك بـەبێ باسـکردنی (سـەنەد) واتـە زنجیرەی ڕاویەکانی نەنووسـنەوە، ئەمـە زنجـیرەی سـەنەدی فـەرموودە (صـحیح)- ڕاسـت‌و دروستەکانن‌و لە کتێبەکانی (سوننەت)دا پارێزراون‌و لەم هـەموو هـەزاران فەرموودانـەداو لـە زنجیرەی سەنەدێکیاندا ناوی (عبدالملك) یان (یزید) یـان (ولیـد) یـان یـەکێك لـە والیـەکانیان وەکو (حجاج)و (خالد القسري)و هاوشێوەکانیان نـابینین ئەگـەر هەشـبوبێت باشـە لـە کـام گۆشەیەکی مێژوودا ون بووە؟ یـان ئەگـەر بـۆ خـۆی دای نـەنابن بـەڵکو داوای کردبێـت بـۆی دابنرێن، بەڵگە لەسەر ئەمە چیە؟[٢]

بەڵام ئەو گومانەی لە لایەن (عبدالحسین)و (أبوریە)وە وروژێنراوە کە گوایە: (أبو هریـرة) بە خاتری ڕازی کردنی ئومەویەکان‌و خەنجـەردان لـە عەلەویـەکان درۆی بـە دەم پێغەمبـەری خوداوە (ﷺ) هەڵبەستوون.[٣]

ئەوا (ئەبو هورەیرە) لە هەموو ئەم درۆو بوختانانە بە پاك دێتە دەرەوەو، چونکە ئـەوان سەبارەت بە ئەمە چەند ڕیوایەتێکی لاوازو هەڵبەستراویان هێناون کە هیچ بنەمایەکیان نیە،[٤] هەر ڕیوایەتێکیشمان سەبارەت بەم جۆرە بابەتە پێگەیشتبێ ئەوا پوچەڵەو تەنها لـە ڕێگـای خەڵکانێکەوە هاتووە کە جاڕیان بۆ خۆیان‌و فیرقەکەیان لێداوەو، بـەهۆی دەمارگیرییـان بـۆ مەزهەبـەکانیان بـێ چـاوڕوانە و ڕوهەڵماڵاوانـە لـە بەرانبـەر هەقـدا خۆیـان قیـت کردۆتـەوەو سنووری ڕێزو حورمەتی هاوەڵانیان بەزاندووەو بە کەیفی خۆیان قسەیان دەرهەق بە هاوەڵـە هەڵبژاردەکان کردووەو تۆمـەتی بێبـاوەڕی‌و گـومڕایی‌و لادانیـان خـستۆتە پـاڵ هەنـدێکیان‌و بوختانگەلێکیشیان بۆ (أبوبکرو عمرو عوسمان‌و کەسانی تریش) هەڵبەستوون.[٥]

---

١ البرهان في تبرئة أبي هريرة من البهتان (ص: ١٢٨).

٢ السنة ومكانتها في التشريع الاسلامي (ص: ٢٠٣).

٣ (أبو هريرة)، عبدالحسين (ص: ٣٥)، أضواء على السنة (ص: ١٩٠).

٤ السنة قبل التدوين (ص: ٤٤١).

٥ العواصم من القواصم (ص: ١٨٢، ١٨٣)، السنة قبل التدوين (ص: ٤٤٣).

مامۆستایانی زانستی فـەرمووده (واتـه فەرموودەناسـان) پـەردەیان لەسـەر ئـەم درۆزن‌و بوختانچیانه هەڵداوەتەوەو، خودا به هۆی ئەوانەوه نیازو کاری بەدی ئەم فیرقانـەی ئاشـکرا کردووەو دەمـامکی لەسـەر ڕوو هـەڵماڵیون، بـەڵێ فەرموودەناسـان پۆلـه سـەربازی خـودای گـەورەو مـەزن بـوون‌و حەقیقـەتی ئـەوانیان ڕوون بەدەرخـستووەو نیـازو پیلانـەکانیان ئاشکراکردوون، هەر حەدیس یان ڕیوایەتێك هاتبێت‌و تیرو توانجی له هاوەڵێك گرتبێت، یـان گومانی لەسەر مەسەلەیەکی ئیمان دروست کردبێت یـان پێـچەوانەی بنـەماکانی ئـایینی پـاك بووبێـت، ئـەوا جـوامێرانی ئـەم هونـەره دەسـتی دروسـتکەرەکەیان دەرخـستووەو ئـەو دەردەشیان دۆزیوەتەوه که پێیەوه گیرۆده بـووه، جا کەواتـه پڕوپاگەنـدەی ئەوانـه مـاڵی قـەڵب‌و سـەر بـه سـاحێب دەکرێتـەوەو، هـەتا بـه بەڵگـەی ڕاسـت‌و دروسـت‌و پەسـند نەیانسەلمێنن ئەوا له بازاڕی زانستدا لێیان وەرناگیرێن، باشه چۆن له خۆڕا قبوڵ دەکرێ که (معاويه) به خاتری تانەو تەشەردان له (عەلی)ی ئـەمیری ئیمانـداران (ڕەزای خـوای لێ بێـت) هاوەڵانی هاندابن به شێوەی درۆو بوختان حەدیس هەڵبەستن؟[1] ئەمـه لـه کاتێکدا زانایـانی ئوممەت له هاوەڵان‌و تابعین شایەدیان بۆ دادپەروەری (معاويه) داوه، ئەویش هەڵوێستەکانی خۆی له بەرانبەر (عەلی) (ڕەزای خوای لێ بێت) ڕوونکردوونەتـەوەو، لـه هـیچ سەرچـاوەیەکی متمانەپێکراویشدا بـاس نـەکراوه کـه (عـەلی) (ڕەزای خـوای لێ بێـت) (أبـو هريـرة)ی بـه درۆ خستبێتەوه، یان ڕێگری بڵاوکردنەوەی (فەرمووده)ی لێ کردبێت، بەڵام هەندێك له دوژمنـانی (أبي هريرة) ڕیوایەتێکی تەزویرو هەڵبەستراوی (أبي جعفر الاسكافي) دەکەنه بەڵگه که: گوایه (عەلی) دەرهەق به (أبي هريرة) وتوویەتی: هۆشیار بن ئەو درۆزنترین کەسـه ، یـان وتبێتـی: (أبو هريرة‌ی دوسی) درۆزنترین کەسه، کـه بـه دەم پێغەمبـەری خـواوه قـسه دەکـات.[2] ئـەم ڕیوایەته پوڵێکی قەڵب‌و له (إسكافي)یەوه وەرناگیرێ، چونکه ئـەو لـه لایەکـەوه شـیعەیەکی لادەرەو،له لایـەکی تریـشەوه موعتەزیلەیـەو دوژمنایـەتی (زانایـانی فـەرمووده)ی کـردووه.[3] ئەمەو (إبن قتيبة) هـەموو ئـەو وتـه تانـەو تەشـەرئامێزانەی ڕەتکردوونەتـەوه کـه لـه لایـەن (عەلی)یەوه وترابن‌و ئاراستەی (أبي هريرة) کرابن.[4]

---

١ السنة قبل التدوين (ص: ٤٤٤).

٢ شرح البلاغة (١/٤٦٨).

٣ السنة قبل التدوين (ص: ٤٤٣).

٤ تأويل مختلف الحديث (ص: ٢٧، ٥١)، السنة قبل التدوين (ص: ٤٦٠).

ج - زۆری ڕیوایەتەکانی:

(نیزامی موعتەزیلی) سەبارەت بە زۆری ڕیوایەتی (أبي هريرة) بۆ فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ڕەخنەی گرتووە، لە کۆندا هەندێك موعتەزیلەی تری وەك (بیشری مریسی)و (ئەبو قاسمی بەڵخی) شوێنپێی (نیزام)یان هەڵگرتووە، بەڵام (ئیبن قوتەیبە) لە کتێبی (تأويل مختلف الحديث)دا بەرپەرچی (نیزام)ی داوەتەوە. هەندێك لەوانەش کە لەم دوادواییانە پەیدا بوون هەمان ڕەخنەیان دووبارە کردۆتەوە (عبدالحسين شرف الدين)ی شیعە مەزەب یەکێکە لەوانو لە کتێبێکدا کە بە ناوی (أبو هريرة) دەری کردووە پەڕەی زۆری لەسەر ئەم بابەتە ڕەشکردوونو[1] گومان دەخاتە سەر ڕیوایەتەکانیو بە زۆریان دادەنێو وای دەباتە مێشکی خوێنەرەوە کە: هەموو ئەو هاوەڵانە -ی بە کاروباری دەوڵەتو سیاسەتەوە سەرگەرم بوون- بە ئەندازەی (ئەبو هورەیرە) فەرموودەیان ڕیوایەت نەکردوون، (أبورية)ش لە کتێبی (أضواء على السنة المحمدية)دا ڕێچکەی ئەوی گرتۆتەبەرو هەمان تەمومژو گومان دەوروژێنێت.[2]

هەموو ئەمانە جاروبار ڕیوایەتی لاوازو دانراو دەکەنە بەڵگەی گومانەکەیانو، جاروباریش بە تەئویلکاریو قیاسی نادروست ڕەخنەکەیان پینەو پەڕۆ دەکەن، ئیدی لە دواییدا گومانو ڕەخنەی ئەمانە بە گومانو ڕەخنەی هەندێك لە کەسانی ڕۆژهەڵاتناسی وەك (جولد تسيهر) دەگەن، کە ئەویش وەکو ئەوان ڕیوایەتەکانی (أبي هريرة) بە زۆر دادەنێ.[3]

خۆلاسەی قسەکانیان ئەمەیە: (أبو هريرة) درەنگ موسڵمان بووە کەچی (٥٣٧٤) حەدیسی لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) ڕیوایەتە کردوون، ئەم ژمارەیە بە ڕێژەیەکی زۆر زیاترە لە ڕێژەی ئەو حەدیسانەی کە لە لایەن چوار خەلیفەکانو هەموو ئەو هاوەڵانە ڕیوایەت کراون لە ئیسلام بووندا پێش ئەویان داوەتەوە.[4] دیارە غەڵەتێکی زۆر گەورەیە کە لە بواری دەرخکردنو زۆر ڕیوایەتکردندا (خەلیفە ڕاشیدەکان) لەگەڵ (أبو هريرة) بەراورد بکرێن، لەبەر ژمارەیەك هۆی وەکو:

.... ڕاستە کە چوار خەلیفە ڕاشیدەکان (ڕەزای خوایان لێ بێت) لە هاوەڵایەتیو ئیسلام بووندا پێش (أبو هريرة) کەوتوونو ئەوەندە فەرموودانەی لە ئەوەوە گێڕدراونەوە لە

---

١ أبو هريرة (ص: ٤٥)، وما بعدها/ السنة قبل التدوين (ص: ٤٤٦).

٢ أضواء على السنة المحمدية (ص: ١٦٠)، وما بعدها.

٣ دائرة المعارف الاسلامية/ مادة (حديث)، نقلا عن السنة قبل التدوين (ص: ٤٤٧).

٤ السنة قبل التدوين (ص: ٤٤٧).

ئەوانــەوە نەگێڕدراونــەوە، بــەڵام ئــەوان بایــەخیان بــە کاروبارەکــانی دەوڵــەت‌و سیاســەتی حوکمڕانی داوەو، زانایان‌و قورئان زانان‌و دادوەرانیان بە وڵاتانـدا نـاردووە تـاوەکو چـۆن بـۆ خۆیان لەسـەریانە کاروبـاری ئوممـەت ڕاسـتەڕێ بکـەن ئـەوا ئـەوانیش ئـەو ئەمانەتـە بـەجێ بگەیەنن کە لەسەر شانیان دانراوە، کەواتە چۆن نابێت (خالیدی کـوڕی وەلیـد) لەسـەر کـەم ڕیوایـەتکردنی حەدیـسەکانی پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) سەرزەنـشت بکـەین، چـونکە بـە فتوحاتـەوە سـەرگەرم بـووە، ئـەوا نابێـت سەرزەنـشتی (أبـو هریـرة)ش بکـەم لەسـەر زۆر ڕیوایەتکردنی حەدیسەکان چونکە خۆی بە زانستەوە سەرگەرم کردبوو.[1]

... خۆساغکردنەوەو یەکلاکردنەوەی (أبو هريرة) بۆ زانست‌و پەخشکردنی.

... درێژبوونی تەمەنی‌و پێویستی زۆری خەڵك بە زانستەکەی، کەواتە بەرانبەرکردنی (أبو هريرة) بە (خەلیفە ڕاشیدەکان) یان (هاوەڵە پێشینەکان) نەك هەر بە مەسـەلەیەکی دروسـت دانانرێت بەڵکو بە هەڵەیەکی گەورە لە قەڵەم دەدرێت،[2] بۆیەش (أبو هريرة) (ڕەزای خوای لێ بێت) ڕیوایەتی لە هی خاتو عائیشە (ڕەزای خـوای لێ بێـت) زۆرتـرن، چـونکە: ئـەم لـە مـاڵی خۆیدا فتوای بۆ خەڵك دەدا، بەڵام (أبو هريرة) لە مزگەوتی پێغەمبەردا (ﷺ) ئالْقەیـەکی بـۆ خەڵك ساز دابوو، بە سیفەتی ئەوەی (پیاو) بوو زیاتر لـە (عائیـشە) هاموشـۆی زۆری هـەبوو لەگەڵ خـەڵك تێکـەڵ دەبـوو، وێـڕای ئەمـە گـەورەترین خـەمی (عائیـشە خـاتوون) خـۆی لـە ئامۆژگاری‌و ئاڕاستەکردنی ئافرەتاندا دەبینیەوەو، هـەموو جـۆرە پیـاوێکیش ڕێگـەی نـەبوو سەردانی بکات تا گوێبیستی ڕیوایەتەکانی ببێت،[3] هەر کەسێك بێت‌و بە چـاوێکی بـە ویـژدان تەنها یەکجار سەرنج بدات، بۆی دەردەکەوێت کە گێڕانـەوەی ئەوەنـدە حەدیـسانە لـە لایـەن (أبو هريرة)ەوە جێگـەی سەرسـوڕمان‌و حەپەسـان نیـەو، چ پێویـستیش بـەو هـەراو هۆسـە ناکات کە لە لایەن دوژمنانی سوننەت‌و گروهە لادەرەکانەوە ئاسمانی پێ پڕکراوە، بێگومـان مـاوەی کـەمی هاوەڵایـەتی ئـەو نابێتـە بەڵگـە لەسـەر دروسـتکردنی گومـان لەسـەر ئـەو فەرموودانەی ئەو لە پێغەمبەری خودا (ﷺ)ەوە گێڕاو نیەوە جا چ بـۆ خـۆی ڕاسـتەوخۆ لـە پێغەمبەری بیستبن یان لە هاوەڵانی بیستبن، بەڵکو ئەو مـاوە هاوەڵایەتیـە وەرگرتنـی زیـاتر لەمەندە فەرموودەش هەڵدەگرێت، چـونکە ئـەم چـوار سـاڵە –لـە ڕووی بانگـەوازو چـالاکی‌و

---

[1] السنة قبل التدوين (ص: ٤٥٠).

[2] المصدر نفسه (ص: ٤٥١).

[3] المصدر نفسه (ص: ٤٥١).

پەروەردەو فێرکردن‌و ئاراستەکردندا– بە گەورەترین ساڵانی دەوڵەتی ئیسلامی سەردەمی پێغەمبەری خودا (ﷺ) دادەنرێن.[1]

... زۆر پابەندبوونی بە پێغەمبەر (ﷺ)ەوە: لە ڕاستیدا چوار ساڵی ڕەبەق بە بەردەوامی لە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)دا بوو، (أبو هريرة) دەڵێت: خەڵك دەڵێن: (أبو هريرة) فەرموودە زۆر دەگێڕێتەوە، ئەگەر دوو ئایەت لە کتێبی خودادا نەدەبوو ئەوە یەك حەدیسم پێ نەدەوتن، ئەمجا خوێندنیەوە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلۡهُدَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِي ٱلۡكِتَٰبِ أُوْلَٰٓئِكَ يَلۡعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلۡعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصۡلَحُواْ وَبَيَّنُواْ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَتُوبُ عَلَيۡهِمۡ وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦٠﴾﴾[2] واتە: (بێگومان ئەو کەسانەی ئەو ئایەتانە دەشارنەوە کە سەبارەت بە نیشانەکانی پێغەمبەرێتی (محمد)و ڕاستێتی (ئیسلام) دامانبەزاندبوون‌و، پێشداش لە کتێبی–ی ئینجیل‌و تەورات–دا بۆ خەڵکمان دەرخستبوون، ئا ئەوانە خوداو نەفرینکاران نەفرینیان لێ دەکەن، جگە لەو کەسانە تۆبەی ڕاست‌و دروست دەکەن‌و خۆیان چاك دەکەن‌و ڕوونی دەکەنەوەو ڕایدەگەیەنن کە تا ئێستا لە هەڵەو تاواندا بوون‌و لەمەولاش ئەو ئایاتانە دەخەنەڕوو کە پێشدا شاردبوویاننەوە، ئا ئەوانە تۆبەیان لێ قبوڵ دەکەم‌و، من تۆبە وەرگری بەبەزەییم).

هەرچی برا کۆچەریەکانمان بوون مامەڵەی نێو بازاڕ سەرقاڵی کردبوون، هەرچی برا پشتیوانەکانیشمان بوون کاروباری باخەوانی‌و سەروەتیان سەرگەرمی کردبوون، هەرچی (أبو هريرة)ش بوو، بە نانەزگی لە خزمەت پێغەمبەری خودا (ﷺ)دا بووو خزمەتی دەکردو لێی جودا نەدەبۆوەو، لە کات‌و ساتێکدا لە خزمەتیدا ئامادە دەبوو کە ئەوان تێیدا ئامادە نەدەبوون‌و، چەند فەرموودەیەکی وای لێ وەردەگرتن‌و دەرخی دەکردن کە ئەوان لێیان وەرنەدەگرتن‌و پێیان لەبەر نەدەکران.[3]

... نزای دەرخکردنی (فەرموودە) لە لایەن پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئەو: (أبو هريرة) دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) من فەرمایشتێکی زۆر لە جەنابتەوە دەبیستم بەڵام لە بیرم دەچنەوە، فەرمووی: ((أبسط رداءك)) واتە: چاکەتەکەت ڕاخە، منیش ڕامخست، جا

---

١ المصدر نفسه (ص: ٤٥٢).

٢ البقرة (١٥٩–١٦٠).

٣ البخاري، رقم (١١٨)، مسلم، رقم (١٥٩).

چنگێکی لێداو ئەمجا فەرمووی: ((ضمه)) واتە: لە ئامێزی وەرێنەو بە سینگتیەوە بگوشە، جا منیش بە سەر دڵمەوە نوساندو، ئیترلەمەولا یەك حەدیسم لەبیر نەچۆوە.[١]

... زۆری شاگردانی: ژمارەی شاگردەکانی‌و لێ ڕیوایەتکەرانی خۆیان لە هەشت سەد (٨٠٠) کەس داوە.[٢]

... درەنگ مردنی: وتراوە لە ٥٨ کۆچیداو بە وتەیەکی تریش لە ٥٩ کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.

ئەمجا ئەو حەدیسانەش کە لە ئەوەوە گێڕدراونەوە بەم جۆرە دابەش دەکرێن:

● ئەوانەی زنجیرەی سەنەد (گێڕەرەوە)کانیان زەعیف‌و لاوازە، بە ڕاست دانانرێن کە لە (أبو هريرة)ەوە داهاتبن.

● ئەوانەی چەند بارە پات بوونەوە.

● ئەوانەی زیاتر لە یەك (ئیسناد)یان هەیە.

● ئەوانەی کە لە گەورە هاوەڵانی وەك دە موژدە پێدراوەکەو دایکانی ئیمانداران‌و غەیری ئەوانەوە گێڕاونیەوە.

● ئەوانەی لەسەر خۆی وەستێنراون‌و بە وتەی خۆی دانراون.[٣]

ئەمەو (بوخاری‌و موسلیم) لەسەر ڕیوایەتکردنی (٣٢٦) حەدیس لە (أبو هريرة)ەوە ڕێککەوتوون‌و، (بوخاری) بە تەنیا (٩٣) حەدیسی تری لێ ڕیوایەت کردووەو، (موسلیم)یش بە تەنیا (٩٨) فەرمودەی تری لێوە گێڕاوەتەوە، ئەمجا (أبو هريرة) لە ڕیوایەتکردنی زۆرینەی ئەو حەدیسانەدا کە لە پێغەمبەری خودا (ﷺ)یەوە گێڕاونیەوە بۆ خۆی بە تەنیا نیە، بەڵکو خەڵکانی تر لە هاوەڵان بەشداری ئەویان کردووە.[٤]

بەڵام (سەبارەت) بە ناڕەزابوونی (شیعە) لە ڕیوایەتەکانی ئەو، ئەوا دەڵێن (جابری کوڕی یەزیدی جەعفی) (٧٠٠٠٠) حەفتا هەزار حەدیسی (بە حیسابی خۆی) لە ڕێی (محمد

---

١ البخاري، رقم (١١٩)، مسلم، رقم (١٦٠٩).

٢ حقبة من التأريخ (ص: ٢٢٣)، سير أعلام النبلاء (٢/٥٧٩).

٣ حقبة من التأريخ (ص: ٢٢٣).

٤ المصدر نفسه (ص: ٢٢٣).

الباقر) (ڕەزای خوای لێ بێت)ەوە ڕیوایەت کردوون‌و (١٤٠٠٠٠) سەدو چل هەزاری تریشی (بە حیسابی خۆی) لە ڕێی تەواوی ئیمامەکانی ترەوە ڕیوایەت کردوون.[١]

(ئیبانی کوڕی تەغلەب)یش (٣٠٠٠٠) سی هەزار حەدیسی (بە حیسابی خۆی) لە ڕێی (جعفری صادق) (ڕەزای خوای لێ بێت)ەوە گێڕاونەوەو،[٢] (محمدی کوڕی موسلیم)یش بە تۆبەی خۆی (٣٠٠٠٠) سی هەزار حەدیسی لە (باقر)ەوەو (١٦٠٠٠) شازدە هەزار حەدیسی تریشی لە (الصادق)ەوە ڕیوایەت کردوون،[٣] ئەمە دژایەتی نێوانیان دەخاتەڕوو، هاوەڵان‌و شوێنکەوتووان‌و زانایان‌و ڕەخنەگرانی زانستی شایەدی توانای باش دەرخکردن‌و خێرا بەبیرهاتنەوەیان بۆ (أبو هريرة) داوە،[٤] (عبداللهی کوڕی عمر) بە (أبو هريرة)ی وت: ئەی ئەبا هورەیرە تۆ لە هەموو ئێمە زیاتر پابەندو هاوەدەمی پێغەمبەری خودا (ﷺ) بووی ە سەبارەت بە (فەرموودە)کانیشی لە هەمووانمان زاناتری.[٥]

(شافعی) دەڵێت: (أبو هريرة) مێشکی دەرخی لە هی هەموو ئەو کەسانە بەهێزترو خێراتر بووە کە لە سەردەمی ئەودا حەدیسیان ڕیوایەت کردوون.[٦]

(الذهبي) دەڵێت: ... (ئەو) گەورەی لەبەرکەران‌و سابتکەرانی فەرموودە بوو.[٧] هەروەها (أبو هريرة) لە بەجێگەیاندنی یەك بە یەکی پیتەکانی ئەو فەرموودانەی لە پێغەمبەری خودا (ﷺ)ەوە بیستبوونی‌و دەرخی کردبوون لەوپەڕی پلەی بەرزدا بوو.[٨]

زۆرێك لە زانایان بەرگریان لە (ئەبو هورەیرە) کردووەو بەرپەرچی هەموو ئەو گومان‌و تۆمەتانەشیان داونەتەوە کە سەبارەت بە ئەو ورووژێنراون، ئەم دوو کتێبەش: (العصرانيون بين مزاعم التجديد وميادين التغريب)[٩]و (موقف المدرسة العقلية من السنة النبوية)[١٠] لە ڕیزی

---

١ خاتمة وسائل الشريعة (ص: ١٥١).

٢ رجال النجاشي (ص: ٩).

٣ مشيخة الصندوق (ص: ٦).

٤ موقف المدرسة العقلية من السيرة النبوية، للأمين الصادق (٢/ ٧٤).

٥ سير أعلام النبلاء (٢/ ٦٠٣، ٦٠٤)، رجاله ثقات، إسناده صحيح.

٦ المصدر نفسه (٢/٥٩٩).

٧ المصدر نفسه (٢/٥٧٨).

٨ المصدر نفسه (٢/٦١٩).

٩ العصرانيون، محمد حامد الناصر (ص: ١١٥).

١٠ موقف المدرسة العقلية (٢/٧٤)، الأمين الصادق الأمين.

ئەو کتێبانەی سەردەمی نوێدان کە تەمی گومانە پوچو بێ بنەماکانی سەر (أبو هریرة)یان ڕامالیون.

د ــ گریانی (أبو هریرة) لە کاتی سەرەمەرگیداو وەسێتی چاکەکردن لە بەرانبەر میراتگرانیدا لە لایەن (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت):

(أبو هریرة) لە کاتی گیانەلادا گریا، پێی وترا چ شتێك دەتگریەنێت؟ وتی: بۆ دنیاکەتان ناگریەم، بەڵکو بۆ دوورو درێژی سەفەرەکەمو کەمی توێشووم دەگریەم، من لە بەرزاییەکەوە شۆڕبوومەوە بۆ سەر قەراغی ئەم دوو شوێنە: بەهەشتو دۆزەخ، نازانم بەرەو کامەیان پەلکێش دەکرێم؟[1] لە ڕیوایەتێکدا هاتووە: (وەلیدی کوڕی عتبەی کوڕی أبي سفیان)ی والی (مەدینە) نوێژی لەگەڵ کرد، (عبداللهی کوڕی عمرو أبو سعیدی خودری‌و خەڵکانێکی تریش) ئامادەی نوێژەکە بوون، لە ماڵی خۆیداو لە (عقیق) کۆچی دوایی کرد، هەڵیانگرتو بۆ (مەدینە)یان برد، نوێژی لەسەر کراو لە (بقیع) نێژرا، بە ڕەحمەتو ڕەزامەندی خودا شاد بێت، (ولیدی کوڕی عتبة) لە نامەیەکدا هەواڵی مەرگی (أبو هریرة)ی بە (معاویە) ڕاگەیاند، (معاویە)ش نامەیەکی بۆ نوسیەوەو فەرمانی پێدا کە بە چاوی مەرحەمەت بڕوانێتە کەسو کارەکەی‌و چاکەیان لەگەڵ بکات، ئەویش دە هەزار درهەمی پێدان‌و، وەك هاوسێیەکی باش لەگەڵیان دەجولایەوەو هەمیشە چاکەی لەگەڵ دەکردن (أبو هریرة) یەکێك بوو لە ڕیزی پشتیوانانی (عثمان)و لە ڕۆژی گەمارۆدرانیدا لە لای بوو.[2]

ـ ئایا (معاویە) ویستوویەتی (مینبەر)ی پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە (مەدینە)وە بۆ شام ڕاگوازێت؟

(الطبري) لە مێژووەکەیدا لە میانەی باسی ڕووداوەکانی ساڵی ٥٠ك یدا دەڵێت: معاویە فەرمانی دا (مینبەر)ی پێغەمبەری خودا (ﷺ) بەرەو (شام) بگوازرێتەوە، جا جولێنراو یەکسەر خۆر گیراو لەو ڕۆژەدا ئەستێرە بە ئاسمانەوە بینران، خەڵك ئەم کارەی ئەویان بە شتێکی گەورەو سامناك دانا، جا (معاویە) وتی: نەمویست هەڵی بگرم، تەنها لەوە ترسام خۆرکە یان مۆرانە لێی بداتو گەندەڵی بکات، جا سەیرم کرد، ئەمجا هەر لەو ڕۆژەدا بەرگی بەبەردا کرد.[3]

---

١ البداية والنهاية (٣٨٤/١١).
٢ البداية والنهاية (٣٨٩/١١).
٣ تأريخ الطبري (١٥٥/٦).

لە ڕیوایەتێكی تردا هاتووە: (معاویە) وتی: بە ڕای من نابێت (مینبەر)ی پێغەمبەری خودا (ﷺ)و (گۆچان)[١] ەكەی لە-نێو دانیشتوانی- (مەدینە) بەجێ بهێڵرێن، چونكە ئەوان بكوژو دوژمنی (عثمان)ی ئەمیری ئیماندارانن، جا كاتێك هاتە مەدینە داوای گۆچانەكەی كرد -كە ئەو ڕۆژە لە لای (سعد القرظی) بوو-، جا (أبو هریرة)و (جابری كوڕی عبدالله) هاتنو وتیان: ئەی ئەمیری ئیمانداران توخوا ئەگەر ئەم كارە بكەی! ، ئەمە كارێكی دروست نیە هەستی مینبەری ڕەسولی خودا لە شوێنێك لابەری كە بە دەستی خۆی لەوێی داناوەو، گۆچانەكەشی لە (مەدینە) بەریتە دەرەوە، جا (معاویە) لەسەر قسەی ئەوان وازی هێنا، بەلام شەش قادرمەی بۆ مینبەرەكە زیاد كردنو پۆزشی بۆ خەڵك هێنایەوە.[٢]

ڕیوایەتەكانی پێشدا قسە لەسەر ئەم مەسەلانە دەكەن:

١- بڕیاری (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) لەسەر: گواستنەوەی مینبەرو گۆچانی پێغەمبەری خودا (ﷺ)، ئەم هەواڵە بەبێ ئاماژەدان بە گۆچان لە لایەن (زبیر بن بكار)[٣]و (یعقوبی)و (إبن الجوزی)[٤]یەوە هاتووە، بەلام (ابن الأثیر)[٥]و (ابن كثیر)[٦] هەواڵی (مینبەرو گۆچان)یان وێكڕا هێناون، ئەمەو دكتۆر (خالد الغیث) دەڵێت: بەسەر ڕیوایەتێكی ڕاستو دروست (صحیح)دا نەكەوتم جەخت لەسەر هەواڵە گوماناویەكانی (واقدی) بكاتەوە، ئەمە جگە لەوە كە: (دینداریو دادپەروەریو پلەی هاوەڵایەتی) معاویە ڕێگرن لەبەر دەم ئەودا مینبەری پێغەمبەری خودا (ﷺ) هەڵگرێتو لە (مەدینە)وە بۆ (شام)ی بەرێ، لە كاتێكدا كە ئەو چاكی دەزانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: ((ما بین بیتي ومنبري روضة من ریاض الجنة))[٧] واتە: نێوان ماڵەكەمو مینبەرەكەم باخێكە لە باخەكانی بەهەشت، (عبدالرزاق)[٨] هەواڵی بە هاتنی (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت)ی بۆ (مەدینە)و زیادكردنی پلەكانی (مینبەر)ی داوە، بەلام ئاماژەی بەوە نەداوە كە (معاویە) ویستبێتی (مینبەر)و

١ هەر جارێك پێغەمبەری خودا (ﷺ) وتاری دابا ئەو گۆچانەی بە دەستەوە دەگرت.
٢ البدایة والنهایة (٢١٤/١١)، تأریخ الطبري (١٥٥/٦).
٣ فتح الباري (٤٦٣/٢)، مرویات خلافة معاویة (ص: ٣٨٨).
٤ المنتظم (٢٢٧/٥).
٥ الكامل في التأریخ (٤٨٢/٢).
٦ البدایة والنهایة (٢١٤/١١).
٧ البخاري، صحیح البخاري مع الفتح (١١٩/٤).
٨ المصنف (١٨٣/٣).

(گۆچان) هەڵبگرێت‌و بیانباتە (شام)، بێگومان زیادکردنی قادرمەکانی (مینبەر)و پۆشاك بەبەرداکردنی لە لایەن معاویەوە لە ڕیزی کارە مەزن‌و هەرە چاکەکانی دادەنرێن، بەلام هەندێك حیکایەتخوان هەوڵیانداوە بیکوژێننەوەو تەمومژی لە دەورە دروست بکەن.[١]

٢ـ بەستنەوەی هەواڵی خۆرگیران بە جولاندنی مینبەر:

ئەمە لە لایەن (عبدالرزاق)و (زبیری کوڕی بکار)[٢]و، (ابن الجوزی)[٣]و (ابن الأثیر)[٤]و (ابن کثیر)[٥]ەوە باسکراوە، لەم نێوە (یعقوبی)[٦]ی شیعە مەزەب پێی وایە لەگەڵ جولێنرانی مینبەرەکە بومەلەرزە ڕوویداوە، ئەوە هیچ کە ئەم هەواڵە سەنەدێکی ڕاست‌و دروست (صحیح)ی نیەو، وێڕای ئەمەش گریمان خۆرگیرابێت، ئەمە لە ئەنجامی جولێنرانی (مینبەر)ەوە نەبووە، هاوشێوەی ئەمە لە سەردەمی پێغەمبەری خودا (ﷺ)دا ڕوویداوە، (بوخاری) لە ڕێگای (مغیرەی کوڕی شعبە) (ڕەزای خوای لێ بێت)ەوە دەگێڕێتەوە: لە سەردەمی پێغەمبەری خودا (ﷺ)داو لەو ڕۆژەدا ئیبراهیمی کوڕی مرد خۆرگیرا، خەڵك وتیان: خۆر بۆ مەرگی ئیبراهیم گیرا، پێغەمبەری خوداش (ﷺ) فەرمووی: ((إنَّ الشَّمس والقمر لاینکسفان لموت أحد، ولا لحیاته فإذا رأیتم فصلوا، وادعوا الله)) واتە: خۆرو مانگ بۆ مەرگ‌و ژیانی هیچ کەس ناگیرێن، جا کاتێك ئەمەتان بینی، نوێژ بکەن‌و لە خودا بپاڕێنەوە، (أبوبکرة) (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: ((إنَّ الشَّمس والقمر آیتان من آیات الله لاینکسفان لموت أحد، ولکن الله تعالی یخوف بهما عبادە))[٧] واتە: خۆرو مانگ دوو نیشانەن لە ڕیزی نیشانەو موعجیزەکانی خودا، بۆ مەرگی کەس ناگیرێن، بەلام خودای بەرزو بالا بە هۆی گیرانیانەوە بەندەکانی دەترسێنێت.

٣ـ تۆمەتبارکردنی (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) بە ڕقئەستووری لە بەرانبەر دانیشتوانی شاری مەدینە (واتە پشتیوانان) چونکە بکوژی (عثمان) (ڕەزای خوای لێ بێت)ن:

---

١ مرویات خلافة معاویة (ص: ٣٨٩).
٢ فتح الباري (٢/٤٦٤).
٣ المنتظم (٥/٢٢٨).
٤ الکامل في التأریخ (٢/٤٨٢).
٥ البدایة والنهایة (١١/٢١٤).
٦ البخاري، صحیح البخاري مع الفتح (٢/٦١٢).
٧ البخاري، صحیح البخاري مع الفتح (٢/٦١٢).

ئەم هەواڵە لە لایەن (ابن الأثیر)[1]ەوە هاتووەو سەنەدەکەی لاواز (ضعیف)ە،[2] لە ڕاستیدا هەڵوێستی هاوەڵان سەبارەت بە بکوژانی (عثمان) ڕوون‌و ئاشکرا بوو، ئەمە لە حاڵێکدا (کعبی کوڕی مالکی ئەنصاری) هانی خەڵکی دەدا پشتیوانی لە (عثمان) بکەن‌و سەری بخەن، پێی وتن: ئەی پشتیوانان: ببن بە پشتیوان‌و سەرخەری خودا (دوو جار ئەمەی وت) جا پشتیوانان هاتنە لای (عثمان)و لەبەر دەرگای ڕاوەستان‌و، (زیدی کوڕی ثابتی ئەنصاری) (ڕەزای خوای لێ بێت) چووە ژوورەوە، پێی وت: ئەوە پشتیوانانن‌و لەبەر دەرگا وەستاون، کە حەز دەکەی ئێمە پشتیوانانی خوداین، ئێمە پشتیوانانی خوداین.[3] جا (عثمان) جەنگی ڕەتکردەوەو وتی: پێویستیم بە ئەوە نیە، واز بێنن،[4] بەڵام سەبارەت بەو تۆمەتانەیان کە گوایە (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) ڕقی لە (پشتیوانان) دەبۆوە، چونکە ئەوان بکوژی (عثمان) (ڕەزای خوای لێ بێت) بوون، ئەمە خۆی لە خۆیدا پوچ‌و بێ بنەمایە چونکە بە گوێرەی ڕیوایەتە (صحیح)ەکان ڕاستی هەڵوێستی پشتیوانان لە بەرانبەر (عثمان) (ڕەزای خوای لێ بێت)دا وەکو ڕۆژی ڕوون درەوشاوەیە، لە لایەکی ترەوە واقیع پێچەوانەی ئەوەیەو، (معاویە) پشتیوانانی لە خۆی نزیک کردوونەتەوەو پۆستی بەرزو گرنگ‌و هەستیاری نێو حوکومەتەکەی پێ سپاردوون، ئەم ڕاستیەش ئەم بوختانە بە تەواوەتی پوچەڵ دەکاتەوە، ئەمە چەند بەڵگەیەکی ئەو ڕاستیەن:

١ـ (فضالەی کوڕی عبیدی ئەنصاری) (ڕەزای خوای لێ بێت) کردبوو بە والی (دیمەشق)،[5] وێڕای ئەمە پۆستی فەرماندەیی هێزی دەریایی ئیسلامی (مصر)یشی پێدا.[6]

٢ـ (نوعمانی کوڕی بەشیری ئەنصاری) (ڕەزای خوای لێ بێت) کرد بە والی (کوفە).[7]

٣ـ (مسلمەی کوڕی مخلدی ئەنصاری) (ڕەزای خوای لێ بێت) کرد بە والی (مصر)و (مغرب) پێکەوە.[8]

٤ـ (رویفعی کوڕی ثابتی ئەنصاری) (ڕەزای خوای لێ بێت) کرد بە ولبی (طرابلس).[9]

---

١الکامل (٢/٤٨٢).

٢ مرویات خلافة معاویة في تأریخ الطبري (ص: ٣٩٠).

٣ فتنة مقتل (عثمان) للغبان–الملحق (ص: ٢٠٠)، إسناد حسن لغیره.

٤ مرویات خلافة معاویة (ص: ٣٩١)، فتنة مقتل (عثمان) (١/١٦٢).

٥ الاستیعاب (٣/١٢٦٢)، الإصابة (٥/٣٧١).

٦ ریاض النفوس للمالکي (١/٨٠).

٧ مرویات خلافة معاویة (ص: ٣٩١)، نقلا عن في تأریخ الطبري.

٨ المصدر نفسه (ص: ٣٩٢).

٩ الاستیعاب (٢/٥٠٤).

## چوارەم: ( مکّه ):

١ـ ویلایەتی (خالدی کوڕی عاصی کوڕی هشام) (ڕەزای خوای لیٚ بیٚت):

ساڵی ٤٢ی ك (معاویه) (خالدی کوڕی عاصمی هشام)ی کرد بە والی (مەککە)،[١] پاش ئەوەی (الطبري) ناوی ئەو کەسانە دەبا کە ساڵانی ٤٢و ٤٣ی کۆچیدا والی (مەککە) بوون، دەبینین دوای ئەمە لە بەرانبەر ناوهێنانی کاربەڕێوەبەرانی ئەو شارە بێدەنگ دەبێت،[٢] ئیتر بەم دەستەواژەیە: والیو کاربەڕێوەبەری هەرێمەکان لەمساڵدا ئەوانە بوون کە لە پێشدا ناومان هێنان،[٣] یان بە دەربڕینێکی لەم جۆرە واز دێنێت، (إبن الجوزي)[٤]و (إبن الأثير)[٥]یش لاسای ئەویان کردۆتەوە.

## پێنجەم: والیەکانی (تائیف):

هەرچەندە (الطبري) ناوی والیەکانی (طائف)ی نەهێناون، بەلاّم ڕیوایەتێکی هێناوەو، ئەوە دەگەیەنێت کە چەند کەسێك لە تیرەی (بني حرب) کاروباری ئیدارەی ئەوێیان بەڕێوەبردبێت، ئەمەش دەقی ڕیوایەتەکەیەتی: (معاویه) ئەگەر بیویستبایە یەکێك لە پیاوانی (بني حرب) بکاتە والی، پێشەکی دەیکردە والی (طائف)، ئەگەر خێری پێوە دیبایەو پێی سەرسام بووایە بەڕێوەبردنی (مەککە)شی بۆ دەخستە سەر ویلایەتەکەی، ئەگەر بە باشی پۆستەکەی بەڕێوەبردبایە (مەدینە)شی لەگەڵ (مکّه وطائف) دەخستە ژێر ڕکێفی حوکمڕانی ئەوەوە، ئەگەر یەکێکی کردبا بە والی (طائف)، دەوترا: ئەوە سەرەتایەتی، ئەگەر بیکردبا بە والی (مەککە) دەوترا: ئاقڵی خڕکردۆتەوە، ئەگەر ویلایەتی (مەدینە)شی پێ سپێردرابایە دەوترا: ئەوە کامڵو بیر تیژ بووە.[٦]

---

١ تأريخ الطبري (٨٧/٦).

٢ مرويات خلافة معاوية في تأريخ الطبري (ص: ٢٧٨).

٣ المصدر نفسه (ص: ٢٧٨).

٤ المنتظم (١٩٣/٥، ٢٠٦).

٥ الكامل في التأريخ، نقلا عن مرويات خلافة معاوية (ص: ٢٧٨).

٦ تأريخ الطبري، مرويات خلافة معاوية (ص: ٢٧٩).

بەڵام سەبارەت بەوە ئەوانە کێ بوون لە تیرەی (بني حرب) کرابوونە والی (طائف)؟ ئەوا (طبري) بێ دەنگەو ناویان ناهێنێت، بەڵام (البلاذري) لە ڕیوایەتەکەیدا ناوی (عنبسەی کوڕی أبی سفیان)و (عتبەی کوڕی أبی سفیان)ی هێناون کە ئەم دوانە والی (طائف) بوون.[1]

## شەشەم: (مصر):

١ـ ویلایەتی (عەمرو‌ی کوڕی عاص) (ڕەزای خوای لێ بێت):

(معاویە) لە ساڵی ٤١ك (عەمروی کوڕی عاص)ی کردە والی (مصر)،[2] بەمە سیاسەتی (دانانی مرۆی شیاو بۆ شوێنی گونجاو)ی پەیڕەو کرد، چونکە سوپای ئیسلام بەسەرکردایەتی (عەمرو) ئەو وڵاتەی فەتح کردبوو، لە هەردووك سەردەمی خیلافەتی (عمرو عثمان) (ڕەزای خوایان لێ بێت)یشدا خودی خۆی والی ئەوێ بوو، بە خاتری ئەمە ئەوا بۆ وەرگرتنی ئەم پۆستە گرنگە لە خەڵکی تر لە پێشترو شایەنتربوو.[3]

ئەمەو ڕیوایەتە هەڵبەستراوو لاوازەکان لە میانەی باسی پەیوەندی نێوان (عەمرو)و (معاویە) (ڕەزای خوایان لێ بێت) لە درێژدادرپیدا زۆریان پێ لێناوەو لەکەگەلێکی دیارو نادیاریان خستوونەتە پاڵ ئەم دوو کەڵەپیاوە، هەندێکیان ئاماژە بەوە دەدەن کە (معاویە) پۆستی ویلایەتی (مصر)ی بە پاداشت داوەتە (عەمروی کوڕی عاص)، چونکە (عەمرو) لە دوای هەڵگیرسانی ئاشوبی دوای شەهیدکرانی (عثمان) (ڕەزای خوای لێ بێت)دا لایەنگری (معاویە)ی کردووە، لە کتێبی (علي بن أبي طالب)دا (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەم مەسەلەم ڕوونکردۆتەوە، بێگومان هەڵوێستی داوای تۆڵەسەندنەوە لە بکوژانی (عثمان) لە لایەن (عەمروی کوڕی عاص)ەوە هەڵوێستێکی سەربەخۆبووەو، پەیوەندی بە هاوکاریکردنی (معاویە)وە نەبووە، بەڵکو هەڵقوڵاوی ئیجتیهادی خودی خۆی بووە، بە ڕای ئەو: دەبووایە یەکسەر تۆڵە لە بکوژەکانی بکرێتەوە، ئەم ئیجتیهادەی (عەمروی کوڕی عاص) سەبارەت بەم بابەتە ڕێك لەگەڵ ئەو ئیجتیهادە هاتەوە کە لە لایەن (معاویەی کوڕی أبی سفیان)ەوە دەرکرا.[4] (عەمروی کوڕی عاص) بە هۆی ئەوە خێوی توانایەکی ئیداری سەرکەوتوو بوو لە بواری سیاسیو سەربازیشدا لێوەشاوە بوو، ئەوا دەسەڵاتێکی بەرفراوانی بەسەر (مصر)ەوە

١ أنساب الاشراف (٣٩/٤)، مرويات خلافة معاوية (ص: ٢٧٩).

٢ مرويات خلافة معاوية (ص: ٢٨١، ٢٨٢).

٣ مرويات خلافة معاوية (ص: ٢٨٢).

٤ مرويات خلافة معاوية (ص: ٢٨٢).

هەبوو و بە چاکی دەستی دەڕۆیشت، ئیدی لە باکوری (ئەفریقیا)دا درێژەی بە (فتوحات)داو لە (مصر)دا پەرەی بە سیستەمی موچەو ئاوەدانکردنەوەو کشتوکاڵو ئاودێری دا،[١] ئەمەو (عمرو) تا لە ساڵی ٤٣ی کۆچیدا کۆچی دوایی کرد بە والی (مصر) مایەوە.

● وەسێتی (عەمرو) لە کاتی سەرەمەرگیدا:

(إبن شماسة المهري) وەسێتەکەی کاتی سەرەمەرگی (عەمروی کوڕی عاص)مان بۆ دەگێڕێتەوەو دەڵێت: لە کاتی گیانەڵادا لە لای (عەمروی کوڕی عاص) بووین، زۆر گریاو ڕووی بەرەو دیوار وەرسوڕاند، کوڕەکەی دەیوت: هۆ بابی خۆم! ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) موژدەی ئەوەی پێ نەداوی؟ ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) موژدەی ئەم شتەی پێ نەداوی؟ ڕاوی وتی: جا ڕووی وەرسوڕاندو وتی: گەورەترین شتێك کە حیسابی بکەین شایەتومانە (أن لا إله إلاّ الله وأن محمداً رسول الله) من لە سێ قۆناغدا ژیاوم: لە قۆناغی یەکەمدا کەسێکی وەکو منت دەست نەدەکەوت هێندە ڕقی لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بێت، هیچ شتێکم بە قەد ئەوە پێ خۆش نەبوو کە بکەوێتە بەر دەستمو بیکوژم، خۆ ئەگەر لەو قۆناغەدا بەو حاڵەوە بمردمایە دەبوومە هاودەمی دۆزەخ، جا کاتێك خودا (ئیسلام)ی خستە نێو دڵمەوە هاتمە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)و وتم: دەستت بێنە بەیعەتت پێ بدەم، دەستی درێژ کرد، بەڵام من دەستم وێ نەدا، (مالك) وتی: ئای (عەمرو) ئەوە چیە؟ وتم: ویستم مەرج دانێم، پێغەمبەر فەرمووی: ((تشترط بماذا)) واتە: چ مەرجێك دادەنێی؟ وتم: لێم خۆش بی، فەرمووی: ((أما علمت أن الاسلام يهدم ما كان قبله وأن الهجرة تهدم ما كان قبلها؟ وأن الحج يهدم ما كان قبله)) واتە: ئەوە نەتزانیوە کە (ئیسلام) گوناهو تاوانەکانی پێش خۆی لەنێو دەباتو شوێنەواریان ناهێڵێت، کۆچیش کردەوەکانی پێش خۆی دەڕمێنێت، (حەج)یش بینای تاوانەکانی پێشدا دەڕوخێنێت؟ ئیدی لەم قۆناغەدا بە لای منەوە کەس بە قەد پێغەمبەری خودا (ﷺ) خۆشەویست نەبوو، کەسیش هێندەی ئەو لەبەر چاوانم گەورە نەبوو، نەمدەتوانی لە ڕاست مەزنایەتی ئەودا چاوم بە تەواوەتی بکەمەوەو تێر لێی بڕوانم، ئەگەر داوام لێ بکەی وەصفی بکەم، ناتوانم ئەمە بکەم، چونکە تێر بە چاوان چاوم لە بەرانبەریدا هەڵنەبڕیون، ئەگەر لەو قۆناغەداو بەو حاڵەوە بمرم ئومێدەوارم بەهەشتی بم.[٢] لە ڕیوایەتێکدا هاتووە: ئینجا دوای ئەوە بە دەسەڵاتداریەوە سەرقاڵ بووم، جا نازانم بە

---

١ مصر في العصر الأموي، عدنان أحمد الجنالبي (ص: ٤٩، ٥٠).

٢ مسلم، (١٢١).

بەرژەوەندیم تەواو بوە نە بە دژم تەواو بووە؟ جا کە مردم شینگێڕم بۆ نەگری تا بەسەر سەرمدا بگریا، مەتحکەورو ئاگر بە دوای تەرمەکەمدا نەهێنی، کفنوو کراسەکەم بە توند لێ بالێنن، چونکە من مشتومڕم لەگەڵ دەکرێت، بە ئەسپایی گڵم بەسەردا بکەن، چونکە لای ڕاستەم لە لای چەپەم شایەنتر نیە تا بە توندی گڵی بەسەردا بکرێت، نە تەختەدار نە تەختە بەرد لە گۆڕەکەمدا بەکارنەهێنن، ئەگەر ناشتانم، ماوەی سەربڕینی وشترێك‌و کەوڵکردن‌و وردکردنی لە لام بمێننەوە، چونکە بە ئێوەوە هۆگر دەبم،[1] (موسلیم) ئەم ڕیوایەتەی بەم شێوەیە لە (صحیح)ەکەیدا هێناوە: تا بە هۆی ئێوەوە هۆگر ببم‌و تەماشا بکەم، بە چ شێوازێك وەڵامی بەرێکراوانی پەروەردگاری مەزنم بدەمەوە،[2] لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: دوای وتنی ئەو قسانە، ڕووی خۆی بەرەو دیوارەکە هەڵسوڕاندو دەیوت: خودایە فەرمانی چاکەت پێ کردین سەرپێچیمان کردی، ڕێگەی (خراپە)ت لێ گرتین وازمان لێ نەهێنا.

بەس لە بازنەی لێخۆشبوونتدا جێمان دەبێتەوە، بە گوێرەی ڕیوایەتێکی تر: دەستی لەسەر کرکراگەی گەردنی داناو، سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوەو، وتی: خودا بەهێز نیم تا خۆم پێ سەربخرێت، بێ بەری نیم‌و تا پاساو بێنمەوە، خۆ بەزلزان نیم بەڵکو داوای لێخۆش بوون دەکەم، لا اله إلا أنت، جا هەتا مرد ئەم قسانەی دووبارە دەکردنەوە (ڕەزای خوای لێ بێت).[3]

٢ـ ویلایەتی (عبدالله ی کوڕی عەمرو‌ی کوڕی عاص) (ڕەزای خوای لێ بێت):

مەرگی (عەمرو) لە شەوی جەژنی ڕەمەزانی ساڵی ٤٣ك یدا بوو، (عبدالله)ی کوڕی ڕاسپارد بۆ ڕاپەڕاندنی نوێژەکان‌و بەڕێوەبردنی کاروباری (خەراج)ی مصر جێی باوکی بگرێتەوە،[4] دوای گەیشتنی هەواڵی مەرگی (عەمرو)، (معاویە) لە مانگی نێوجەژنان (ذي العقدة)ی ٤٣ك یدا (عوتبە)ی برای کردە والی (مصر)،[5] واتە ویلایەتی (عبدالله ی کوڕی عەمرو) بەسەر (مصر)ەوە زیاتر لە دوو مانگی نەخایاند، کە ئەو ماوەیە بریتی بوو لە

١ البداية والنهاية (١١/١٦١).
٢ مسلم، (١٢١).
٣ البداية والنهاية (١١/١٦١).
٤ ولاة (مصر) للكنيدي (ص: ٥٧).
٥ المصدر نفسه (ص: ٥٧).

گەیشتنی هەواڵی مەرگی (عەمرو)و دەرکردنی بڕیاری ڕەسمی خۆی بۆ دامەزراندنی والیەکی نوێ بۆ (مصر).[1]

(الذهبي) بەم شێوەیە وەصفی (عبدالله ی کوڕی عەمرو) دەکات: پێشەوای زانای خوداپەرست، هاوەڵی پێغەمبەری خوداو کوڕی هاوەڵی پێغەمبەری خودا، أبو محمد، دەڵێن: (أبو عبدالرحمن)یشی پێ وتراوە، باوکی تەنها بە (١١) ساڵ یان شتێك زیاتر لە ئەو بە تەمەنتر بووە، وەك پێمان گەیشتووە: لە پێش باوکیدا موسڵمان بووە، دەوترێ: ناوی (عاص) بوو جا کاتێك موسڵمان بوو، پێغەمبەر (ﷺ) گۆڕی بۆ (عبدالله)،[2] زێڕو زەبەرێکی زۆری لە باوکیەوە بۆ بەجێما، ئەو لە هاوەڵە سەردارەکان بوو.[3]

٣ـ ویلایەتی (عوتبەی کوڕی أبی سفیان):

(عوتبە) لە سەردەمی پێغەمبەری خودا (ﷺ)دا لە دایك بوو، (عمری کوڕی خطاب) (ڕەزای خوای لێ بێت) کردی بە والی (طائف)و سەرپەرشتیکاری کاروباری زەکاتی ئەوێ، ئەمجا کە (عەمروی کوڕی عاص) مرد، (معاویە) کردی بە والی (مصر)، وتاربێژێکی قسەڕەوانو زمانپاراو بوو، وتوویانە: لە بواری وتاربێژیدا کەسێك لەنێو (بەنی ئومەییە) بە قەد ئەو بە توانا نەبووە، ڕۆژێك وتارێکی بۆ خەڵکی (مصر)داو وتی: ئەی دانیشتوانی (مصر) بە زمانی لوستان بە هەق هەڵدەڵێن بەڵام ڕەفتاری پێ ناکەن، بە ئاسانی زەمبی ناهەق دەکەن بەڵام ڕەفتاری پێ دەکەن، وەکو (گوێدرێژ) بارە کتێب هەڵدەگرێت قورساییەکەی ماندووی دەکات، بەڵام زانستەکەی سودی پێ ناگەیەنێت، من تەنها بە شمشێر چارەی دەردتان دەکەم، دەست بۆ قامچی نابەم ئەگەر شوڕك چاکتان بکات، ئەگەر بە دووەمیان چاك نەبن دەستبەرداری بەکارهێنانی ئامرازی یەکەم نابم، پابەند بن بەو شتەوە کە خودا لەسەری واجب کردوون، ئەو شتەتان دەست دەکەوێت کە خودا لەسەر ئێمەی واجب کردووە بۆتان دەستەبەر بکەین، ئیمڕۆ ڕۆژێکە سزاو تۆڵەی تێدا نیەو، دوای خۆیشی تورەیی تێدا

---

١ مرویات خلافة معاوية (ص: ٢٨٦).

٢ سير أعلام النبلاء (٣/٨٠).

٣ المصدر نفسه (٣/٩١).

نیه.[١] له ڕیوایەتێکی تردا هاتووه: مافی ئێمەیه گوێڕایەڵیمان بکەن، مافی ئێوەیه دادپەروەر بین لەگەڵتان، هەرلایەکیشمان پەیمانی شکاند خوێنی خۆی لەسەر خۆی، مصریەکان لە سوچ‌و کەنارەکانی مزگەوتەوە بە دەنگی بەرز وتیان: گوێڕایەڵی، گوێڕایەڵی، ئەویش بۆی ستاندنەوە: دادپەروەری، دادپەروەری.[٢]

ئەمەو (عوتبە) پاش گەڕانەوەی لە سەنگەرنشینیەکەی ئەسکەندەرییە لە کۆشکی فەرمانڕەوایەتیدا نیشتەجێ بوو،[٣] بە خاتری پەروەردەو خوێندنی زانست زانایەکی بەناوی (عبدالصمدی کوڕی عبدالأعلى) بۆ ڕۆڵەکانی گرتبوو، ، ئەو لەگەڵی ڕێککەوتبوو تا مامۆستایەتی ڕۆڵەکانی بکات،[٤] هەڵی دەنا شەوق‌و زەوقیان بخاتە سەر زانیاری‌و، خوێندنەوەی کتێبیان بە لاوە شیرین بکات‌و، پێی وت: قورئانیان فێر بکە، هێندەیان بەسەردا مەدە لێی بسڵەمنەوەو، فەرامۆشیشیان نەکەی نەبادا وازی لێ بێنن،[٥] له ڕیوایەتێکدا هاتووه: یەکەم هەنگاو کە پێویستە بۆ چاکسازی ڕۆڵەکانم بینێی، با چاککردنی خۆت بێت، چونکە چاوەکانیان بە چاوەکانی تۆوە بەستراونەوە، ئەو شتە بە لای ئەوانەوە جوان‌و چاکە، کە تۆ بە جوان‌و چاکی دادەنێی، ئەو شتەش بەلایانەوە خراپ‌و قێزەونە، کە تۆ بە خراپ‌و قێزەونی دادەنێی، فێری کتێبی خودایان بکە تۆبزیان لێ مەکە لەسەر خوێندنی نەك لێی بێزار ببن، بە یەکجاریش وازیان لێ مەهێنە نەك فەرامۆشی بکەن، ئەمجا پاکترین هۆنراوەیان پێ دەرخ بکە، پیرۆزترین حەدیسیان پێ ڕەوان بکە، هەتا بە تەواوەتی فێری زانستێکیان نەکەی نەچی بیانگوازیەوە بۆ فێرکردنی جۆرە زانستێکی تر: چونکە کەڵەکەبوونی وشەو ڕستە سەر لە فێرخواز دەشێوێنن، فێری چۆنیەتی ژیانی حەکیمان‌و ڕەوشتی ڕەوشتبەرزانیان بکەو، گفتوگۆی گەڵ ژنانیان لەبەر چاو بخە، هەڕەشەیان بە من لێ بکەو، بەبێ من ئەدەبیان دادە، وەکو ئەو پزیشکە بە بۆیان کە تا دەردەکە نەزانێ پەلە لە دانانی دەرمان‌و چارەسەر ناکات، پشت بە عوزرو بەهانەی من مەبەستە: چونکە من پشتم

---

١ الاستيعاب (رقم: ١٩٢٣).

٢ النجوم الزاهرة (١٢٤/١)، مصر في العصر الأموي (ص: ٨٢).

٣ النجوم الزاهرة (٣٤/١)، مصر في العصر الأموي (ص: ٨٢).

٤ مكانة العلم في التراث الغربي للزبيدي (ص: ١٠٦).

٥ البيان والتبيين للجاحظ (٧٣/٢).

بە تواناو لێوەشاوەیی تۆ بەستووە، تـا زیـاتر لەسـەر ڕەوشـتو زانـست ڕایـانبێنی إنـشاءالله پاداشتی زیاترت پێ دەدەم.[١]

ئەم وەسێتە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە والیـەکانی دەوڵـەتی (ئومـەوی) سـووربوون لەسـەر پەروەردەو فێرکردنی ڕۆڵەکانیان، لەپێش هەموو شتێکیشەوە هەوڵیان داوە فێـری قورئـانو فـەرموودەو هۆنراوەیـان بکـەنو زیـاد لەمـەش تەئکیـدیان لەسـەر لایـەنی پـەروەردە کردۆتەوەوفێری ڕەوشتو خوخدەی شیرینیان کردوون، دیـارە دەسـەڵاتێکی فراوانیـشیان داوەتـە دەسـت مامۆسـتایانی ڕۆڵـەکانیانو لـە بـواری مـادیو مەعنەویشەوە حیسابیان بـۆ کردوون.[٢]

٤ـ ویلایەتی (عوقبەی کوڕی عامری جوهەنی) (ڕەزای خوای لێ بێت) ٤٥ك–٤٧ك:

(طبري) باسی ویلایەتی (عوقبەی کوڕی عامری جوهـەنی) بەسـەر (مـصر)ەوە فـەرامۆش کردووە، (إبن الجوزي و إبن الأثیر و إبـن کـثیر)یـش شـوێنپێی ئـەویان هـەڵگرتووە، ئەمـە لـە حاڵێکـدا سەرچـاوە مێژووییـەکانی تایبـەت بـە وڵاتـی (مـصر) ویلایـەتی ئـەویان بەسـەر (مصر)ەوە چەسپاندووە،[٣] کە بێگومان ئەم سەرچاوانە لەم شوێنەدا لە پێش سەرچـاوەکانی تـردا حیـسابیان بـۆ دەکرێـت،[٤] هـەروەها چـۆن (إبـن عبـدالبر)[٥] و (إبـن حجـر)[٦] ئەمـەیان سەلماندووە، (عوقبە) زاناو قورئانخوێنو ڕەوانبێژو شـەرعزانو حیـسابگەری بـواری مـیراتو شاعیرێکی پایەدار بوو، لە قورئانخوێندندا دەنگخۆشترین کەس بـوو، (عمـری کـوڕی خطـاب) پێی وت: قورئانم بۆ بخوێنە، کە دەستی بە خوێندن کرد، (عمر) گریانی هات، عوقبە هـاوەڵ بوو، لەسەر کۆچکردن بەیعەتی بە پێغەمبەری خودا (ﷺ) دابوو، لەگەڵ ئەو لـە (مەدینـە)دا نیشتەجێ بوو، لە ڕیزی ئەهلی صوففە بوو، یەکێك بـوو لـە تیرانـدازە بەناوبانگـەکان، سـاڵی ٥٨ ك کۆچی دوایی کرد.[٧]

---

١ عیون الأخبار (٢/٥، ٦٦)، البیان والتبیین (٢/٧٣، ٧٤).

٢ التعلیم في العصر الأموي للسبتي (ص: ٦٦).

٣ مرویات خلافة معاویة في تأریخ الطبري (ص: ٢٨٧).

٤ المصدر نفسه (ص: ٢٨٧).

٥ الاستیعاب، رقم الترجمة (١٨٩٨).

٦ الإصابة (٤/٥٢١).

٧ سیر أعلام النبلاء (٢/٤٦٨).

٥ـ ویلایەتی (مسلمةی کوڕی مخلدی ئەنصاری) ٤٧ـ٦٢ك:

موسلیمەی کوڕی موخەللەدی ئەنصاری خەزرەجی، ئەمیرو کاربەڕێوەبەری سەر بە (معاویە) بوو لە (مصر)، بە (أبو معن) بانگ دەکرا، دەڵێن (أبو سعید)و بە قەولێکی تریش (أبو معاویە)ی پێ وتراوە، پلەی هاوەڵایەتی هەبووە، باوکی هاوەڵ نەبوو.[1]

(موجاهید) دەڵێت: لە دوای (مسلمةی کوڕی مخلد) نوێژم کرد، سوڕەتی (بقرە)ی خوێند، نە (واو) نە (ئەلیف)ێکی بەجێ نەهێشت.[2]

(اللیث) دەڵێت: ساڵی ٤٧ك (عوقبەی کوڕی عامر) لە پۆستی ویلایەتی (مصر) لێخراو، (مسلمةی کوڕی مخلد) بوو بە والی ئەو وڵاتەو تا لەسەردەمی (یزید)[3] داو لە مانگی نێو جەژنانی ٦٢ك لە (ئەسکەندەریە) کۆچی دوایی کرد لەسەر ئەم پۆستەی مایەوە.[4]

ئەو لە میانەی فتوحاتی (باکوری ئەفریقیا)دا ڕەنجی زۆری کێشا –کە بە ئیزنی خودا سەرەی باسکردنی دێت–، وڵاتی (مغرب)یش بە تەواوەتی سەر بە قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی ئەوبوو،[5] ئەمانەی باسکران گرنگترین والیو ویلایەتەکانی سەردەمی خیلافەتی (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) بوون، دەکرێت سنووری دەسەڵاتی والیەکان لە ویلایەتەکانیاندا لەم چەند خاڵانەدا کورت بکەینەوە: وەك: دامەزراندنی کارمەندان، پێکهێنانی کۆڕەکانی ڕاوێژکاری، دامەزراندنی پۆلەکانی سوپاو ئامادەکردنیان بە نیسبەت ویلایەتە سنووریەکانو نزیك هێڵەکانی بزوتنەوەی فتوحاتی ئیسلامی، وەکو (مصرو بصرە)، پاراستنی ئاسایشی نێوخۆ، سەرپەرشتیکردنی دەزگای (دادوەری)ی ویلایەت، کاروباری دارایی، چاودێریکردنی بارودۆخی ویلایەتو چەند دەسەڵاتی تریش.

---

١ نفس المصدر (٣/٤٢٤).

٢ نفس المصدر (٣/٤٢٥).

٣ نفس المصدر (٣/٤٢٥).

٤ نفس المصدر (٣/٤٢٦).

٥ مصر في العصر الأموي (ص: ٨٣).

# فەسلی چوارەم

## ( فتوحات لە سەردەمی ( معاویە )دا ( ڕەزای خوای لیٚ بیٚت )

لە پێناو ڕەواندنەوەی هەرچی گومانەو پوچکردنەوەی هەرچی بۆچوونە سەبارەت بەوە کە: (ئیسلام لە دوای سەردەمی خەلیفە ڕاشیدەکان –لەبواری حوکمڕانیەوە– کۆتایی پێهاتووە)، دەمانەوێ چالاکیەکانی بزووتنەوەی فتوحاتو کاروانی جیهادی ئیسلامی تۆمار بکەین کە لە سەردەمی (ئومەوی)یداو لەگەڵ دەستبەکاربوونی (معاویە) بۆ پسانەوە ئەنجامدراون، ئامانج لە بزوتنەوەی فتوحات کە لە سەردەمی (خیلافەتی ڕاشیدە)وە بەرپابوو لە سەردەمی (ئومەوی)یشدا کاروانی هەر بەڕێوەبوو، بە تەنها بەرفراوانکردنی زەوی (دەسەڵات) نەبوو، بەڵکو هەر دروست نیە بەو چاوەوە تەماشای بکرێت، ئەم بزوتنەوەیە لە مێژوودا گەورەترین بزوتنەوەی هیدایەتخواز بوو خەڵکی لە تاریکاییەکانەوە بەرەو ڕووناکایی گواستەوە، ڕاستیو دروستی ئەم ڕستەیە: لە سەرەتای بەراوردکردنێکی سەرپێیانەی ئامانجەکانی ئەم بزوتنەوەیە بە پروپاگەندەی بزوتنەوە فراوانخوازەکان لە هەستی ڕۆشنبیراندا سەرهەڵدەدا، پروپاگەندەی (دەوڵەتە زلەکان) ئەوەبوو کە مەبەست لە بزوتنەوە فراوانخواریەکانیان بڵاوکردنەوەی شارستانیەکانیانە، جا کەواتە با تەماشایەکی مێژووی ئیمپراتۆریەتە کۆنو نوێکان بکەین: (فیرعەونی، ئاشووری، فەینەقی، ڕۆمانی، فارسی، هیندی، چینی، بەریتانی، فەرەنسی، ئەمریکی، ڕووسیو، هەموو ئەو ئیمپراتۆریەتە نەفامیانەی کە مێشکی مێژووی سەر زەمینیان بە هاتوهەرای خۆیان کاس کردووە، هەر یەکێك لە ئەمانە: سەرەتا چۆن بەرپا بوو؟ چ شتێکی لەسەر زەویدا بڵاوکردەوە؟ بێگومان لەسەر بنەمای هێزو زەبرو زەنگو داپڵۆسینو مل پێکەچکردنو بە نۆکەرکردنی گەلانی وڵاتانی داگیرکراو بۆ دەوڵەتی (دایك) بەرپا بوو، ئەو خەڵکە ڕەشو ڕووتانە بە ناچاری داگیرکەرانیان خزمەت دەکردنو بە پێشکەشکردنی گەنجانی جەنگاوەرو تەواوی خێروبێری وڵاتەکانیان پشتگیریان دەکردنو، ئیتر ئەوانیش لەسەر حیسابی برسیە داماوەکان سنووریان دەبەزاندو سكو گیرفانی خۆیان پڕ دەکرد، ئەمەی وتمان ڕاستیەکی بەڵگەنەویستەو مشتومڕ هەڵناگرێت.[1] بەڵام سەبارەت بەوە چی لەسەر زەویدا بڵاوکردۆتەوە،

---

١ كيف نكتب التأريخ الإسلامي (ص: ١١٨، ١١٩).

ئەوا بێگومان بە پەنا ئەنجامدانی هەندێك چاكە خراپەیەكی زۆریشی ئەنجام داوە، چونكە نوێنەرایەتی خودی خۆی كردووەو بە شوێن مەشخەڵی پەروەردگاردا هەنگاوی هەڵنەگرتووەو، جگە لە كەمێك چاكەو زۆرێك لە خراپەو گەندەڵی هیچی تری لە هەگبەیدا پێ نەبووەو، هەموو جامێكیش ئەو شتەی لێ دەڕژێت كە تێی كراوەو، نەداریش شتێكی پێ نابەخشرێت كە نیەتی، بەڵام (شارستانیەتی خۆرئاوا)ی ئیمڕۆ كە دەوڵەتە زلهێزە داگیركەرەكان خۆیانی بە خاوەن دەزانن، دەستكەوتو پەرێزەكانی -كە بریتین لە داگیركردنی خاكی وڵاتانو تاڵانو بڕۆی خێراتەكانیانو چەوساندنەوەو داماوكردنی گەلەكانیان- باشترین بەڵگەن لەسەر خراپیو گەندەڵیەكەی. دوا بەرنامەی ئەم شارستانیەتە كە (سیستەمی نوێی جیهانی) پێ دەگوترێ، تەنها جۆرێكی نوێیە لە خۆسەپاندنی دەوڵەتە بەهێزەكان بەسەر دەوڵەتە لاوازەكان،دیاترین نەخشەی داڕێژراوی بریتیە لە سوودگەیاندن بە دەوڵەتانی خۆرئاوای زلهێزو نەشكانی بازاڕیانو زیاتر دەوڵەمەندبوونیانو زیاتر هەژاركەوتنو داماوكردنی خەڵكانی ڕەشو ڕووت، بە ناوی سیستەمی نوێی جیهانی) فەرمانی خۆیان بەسەر وڵاتانی بەرهەمهێنەری نەوتدا دەسەپێنن، تا نەوتی زیاترو بە نرخی كەمتر بخەنە بازاڕەوە، هەروەها كۆمەككردنی (ئیسرائیل)و بێبەشكردنی دەوڵەتانی عەرەبی لە پەیداكردنی توانای بەرپەرچدانەوەی هێرشی دوژمنكارانە یەكێكی ترە لە پیلانە كاریگەرەكانی ئەو شارستانیەتە، ئەی خاوەنی كتێبە ئاسمانیەكانی پێشوو لە (یەهودو نەسارا) چیان لە زەویدا بڵاوكردۆتەوە؟

(جولەكەكان) دینەكەیان تایبەت كردووە بە (بنی إسرائیل)و خستوویانەتە قاڵبی ڕەگەزپەرستیو دەمارگیریەوە، بە خاتری ئەوە (خودا) تایبەت بێ بە خۆیانەوەو كەس نەبێت بە برابەشیان حەز ناكەن دینەكەیان بڵاوبكەنەوە.

(نەصرانیەكان)یش لە سەردەمی (پۆلس)ەوە هەوڵ دەدەن دینەكەیان بە هەموو لایەكدا بڵاوبكەنەوە، ئەی چیان بڵاوكردۆتەوە؟ هەر لە سەرەتاوە، لە باتی ئەوە ئەو دینە بڵاوبكەنەوە كە خودای مەزن بۆ سەر (عیسا) (سەلامی خوای لێ بێت)ی دابەزاندبوو دینێكی بتپەرستانەیان بڵاوكردەوە، دینێك (عیساو ڕوحی قودس -جبریل علیە السلام-ی لەگەڵ خودا)ی تێدا دەپەرسترێت، خودای بەرز دەفەرموێت: ﴿ لَقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ

﴿ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ﴾[١] واتـە: بەڕاسـتی ئەوانـەی کـە وتیـان: (ألله) بریتیـە لـە مەسـیحی کـوڕی مەریەم کافر بوون.

خودای بەرز دەفـەرمووێت: ﴿لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٖ﴾[٢] واتـە: بـە ڕاستی ئەوانە کافر بوون کە وتیان (ألله) سێیەمی سێ پەرستراوەکانە کە بریتین لـە (عیـساو جبریلو الله)و بە لای هەندێکیشیانەوە (الله)ی باوکو (مریم)ی هاوسەرو (عیسا)ی کوڕی.

خودای بەرز دەفەرمووێت: ﴿مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤۡتِيَهُ ٱللَّهُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحُكۡمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُواْ عِبَادٗا لِّي مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِن كُونُواْ رَبَّٰنِيِّـۧنَ بِمَا كُنتُمۡ تُعَلِّمُونَ ٱلۡكِتَٰبَ وَبِمَا كُنتُمۡ تَدۡرُسُونَ ٧٩﴾[٣] واتە: مەحاڵە مرۆڤێك خودا کتێبو ژیریو شارەزاییو پلەی پێغەمبەرێتی خەڵات کردبنو ئەمجا بە خەڵکی وتبێت: لەگەڵ (ألله) من بپەرستنو ببنە بەندەم، بەڵکو پێی وتوون: لەبەر ئەوە ئێوە لە کتێبی خودا دەزاننو خەڵکی فێر دەکەنو دەیخوێننەوە کەواتە دەبێ سەربە خودا بنو زاناو داناو چاکساز بن.

ئیدی دینێکیان بڵاوکردەوە کە بانگەشەی بۆ ڕەبەنیوپشتگوێخستنی دنیاو بە کەمدانانی جەسـتەو غـەریزەکانی دەکـرد، لـە ئەنجامـدا پـەکخرانی ژیـانو گـوزەرانو پـشتگوێخرانی ئاوەدانکردنەوەی زەوی لێ دروست بوو، ئـەمجا لـە بەرانبـەر ئەمـەدا کاردانەوەیـەکی خـراپتر دروست بوو کە بریتی بوو لە: پێداگیری لەسـەر چێژی جەسـتەو شـتە مادديـەکان.[٤] خـودای بـەرز دەفـەرمووێت: ﴿وَرَهۡبَانِيَّةً ٱبۡتَدَعُوهَا مَا كَتَبۡنَٰهَا عَلَيۡهِمۡ إِلَّا ٱبۡتِغَآءَ رِضۡوَٰنِ ٱللَّهِ فَمَا رَعَوۡهَا حَقَّ رِعَايَتِهَاۖ فَـَٔاتَيۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنۡهُمۡ أَجۡرَهُمۡۖ وَكَثِيرٞ مِّنۡهُمۡ فَٰسِقُونَ﴾[٥] واتـە: (ڕەبـەنی)یـان داهێنـا – لەسەر خۆیان نەزر کرد هاوسەرگیری ئەنجام نەدەنو بە شـێوەی گۆشـەگیری لـە پەرسـتگاو ئەشکەوتەکاندا خواپەرستی بکەن–، ئێمە ئەمەمان لەسەر واجب نەکردبوون، بەڵام ئەوان بۆ خاتری ڕەزای خودا لەسەر ئەم بیدعەیە سووربوون، جا مـافی خۆیـان پـێ نـەداو چـاودێریان نەکرد، ئەوانەیان کە ئیمانیان بە عیساو محمد هێنـا پاداشـتمان دانـەوەو زۆرینەشـیان لاڕێ بوون.

---

١ المائدة (٧٢).

٢ المائدة (٧٣).

٣ ال عمران (٧٩).

٤ كيف نكتب التأريخ الإسلامي (ص: ١١٩).

٥ الحديد (٢٧).

بە هاوشانی ئەم جۆرە دینە سیستەمێکی (کەهنوتی) کە خۆی لە کەنیسەو پیاوانیداو لە سەرووی ئەوانیشەوە (پاپا)دا دەنواند، لە هەموو بوارەکانی ژیاندا چەندین جۆر سەرپێچی قێزەونی پێڕەو دەکردو، دژایەتی فکری دەکردو ئاقڵی بەند دەکردو زانایانی دەچەوساندنەوەو نەیدەهێشت توێژینەوەی زانستی و ئەزموونی و بیردۆزەیی ئەنجام بدەن، لە ئەنجامدا ژیان لە هەموو بوارەکاندا دواکەوت، ئەمجا کاردانەوەیەکی خراپتر ڕوویدا، کە خۆی لە بێباوەڕی و دورخستنەوەی دین لە ژیان بەڵکو دژایەتی کردنی (دین)دا دەنواند بەم شێوەیە پەیامی ئاسمان لەسەر دەستی کەنیسە گۆڕانی بەسەردا هات و لەو ئامانج و ئاراستانەی جیاکرایەوە کە خودا لە پێناو بەدیهاتنیاندا دایبەزاندبوو، ئیتر لە هەردوو قۆناغی کەنیسەدا واتە قۆناغی بالادەستبوونی بەسەر خەڵکداو، قۆناغی هەڵگەڕانەوەی خەڵك لە دژی و بالادەستبوونی خەڵك بەسەریداو ڕەتکردنەوەی گەردنکەچیان بۆ (دین)دا گەندەڵی و خراپەکاری لە جیاتی چاکەو چاکسازی بڵاوبۆوە.[1]

لە بەرانبەر ئەمەدا کاروانی فتوحاتی ئیسلامی شتێکی دەگمەن و تاقانەیە لە مێژوودا، ئەو فراوانخوازە نیە کە ڕژێمە جاهیلیەزلهێزودنیاخۆرە کۆن و نوێیەکان کردوویانەو دەیکەن، ئەو سەرکەشە گەندەڵخوازەش نیە کە نەصرانیە شێوێنراوەکە پەیڕەوی دەکردو بە ڕاست و چەپی زەویدا پەلی دەهاویشتن، بەڵکو لەم بزوتنەوە تاقانەی نێو مێژوودا موسڵمانەکان لەجێی گومڕایی ڕێنمایی و لە جێی تاریکایی ڕووناکایی و، لەجێی پەرستنی حوکمڕان و کاهین و بتەکان خوداپەرستی ڕاستەقینەیان بڵاو دەکردەوەو، کۆیلەکانی سەر زەویان ئازاد دەکردن و مرۆڤبوونە لەدەستچووەکەیان بۆ دەگێڕانەوەو، بۆ ئەو شوێنەیان دەگێڕانەوە کە شیاوە بۆ مرۆڤ و، ڕەوشت و بەهاکانیان لە دادپەروەری و برایەتی و لێبوردەیی و بە خەم یەکترەوەبونیان لەنێودا بڵاودەکردنەوە کە نە لە کۆنداو نە لە ئێستاو داهاتوشدا شتێکی لەم بابەتانە لە غەیری ئیسلامدا نابینرێن، شارستانیەتێکی ڕاستەقینەی سەرتاپاگیری سەربەرزی وایان پەخش دەکرد، کە بەس بە ملکی خۆیان دانەدەنا، بەڵکو دەروازەی لەبەردەم هەموو موسڵمانێکی ئەم سەر زەمینە لەسەر پشت بوو، نەصرانیەکان لە ئەندەلوس و خۆرهەلاتی ئەوروپاو، جولەکەکان لە تەواوی جیهانی ئیسلامیداو، بتپەرست و گاپەرستەکان لە هیندستان و، هەر خەڵکانێکیش بهاتبانایەو بیانویستبایە بخوێنن یان بە

---

١ كيف نكتب التأريخ الإسلامي (ص: ١٢٠).

ئاشتیو تەبایی بژیەن، ئەوا لە ژێر سایەی ئەم شارستانیەدا دەحەوانەوەو دەحەسانەوە،[١] موسڵمانەکان وڵاتە فەتحکراوەکانیان ژێردەستە نەدەکردنو دەسەڵاتی ڕەهای خۆیان بەسەردا نەدەسەپاندنو بە پاساوی پاسلێکردنیشیان باڵی دەسەڵاتی خۆیان بەسەردا نەدەهێشتنەوەو سەروەتو سامانەکانیشیان لێ بە تاڵان نەدەبردن.

سەرەتا بانگهێشتیان دەکردن بۆ (ئیسلام) کە هەموو خێرێکی بۆ هەموو لایەك لەخۆ گرتووە، ئەگەر بە دەم بانگەشەکەوە باتبانو قبوڵیان کردبایە ئەوە دەبوونە برای دینی، ئەگەر ڕەتیان کردبایەوە داوایان لێدەکردن سەرانەیەك بدەنو ڕێگا بەو خێرو ڕووناکیە نەگرن بچێتە دڵو مێشکی خەڵکەوە کە خودا بە خەڵات بۆ مرۆڤایەتی دابەزاندووە، ئەگەر موسڵمان نەبوونایەو ڕێگەشیان بە بڵاوکردنەوەی گرتبایە، ئەو کاتە جەنگ ڕووی دەدا، ئەم جەنگە بۆ ئەوە نەبوو خەڵك بە زۆریو تۆبزی موسڵمان بکرێن، نەخێر: بەڵکو بە خاتری تێکشاندنی ناوەندەکانی هێزو توانایان بوو کە نەیاندەهێشت هەق وەکو خۆی بە خەڵك ڕابگەیەنرێت، جا کە ئەم ناوەندانە لەنێو دەبرانو کاریگەیان لەسەر دەروونی خەڵك لادەچوو، خەڵك لە ژێر سایەی ئیسلامدا ئازاد دەبوونو بە ئارەزووی خۆیان چ دینێکیان هەڵبژاردبایە کەس بۆی نەبوو ڕێیان پێ بگرێت.[٢] بێگومان (بزوتنەوەی فتوحاتی ئیسلامی) بە هەر سێ تەوەرەکەیەوە: (پاڵنەرەکانی، تایبەتمەندیەکانی، شوێنەوارو ئەنجامەکانی) بابەتێکی سەرەکیە لە نوسینەوەی (مێژووی ئیسلامی)داو پێویستە بۆ هەڵوەشاندنەوەی تەونی گومانی خۆرهەڵاتناسانو شاگردە عەرەبو عەجەمەکانیان بە تێرو تەواوی باسی لێوە بکرێت...

هەرچەندە ئێمە (لێرەدا) لە گۆشەیەکی دیاریکراودا باسی دەکەین، تەنها وەکو نیشانە لەسەر بوونی ئیسلامو ئاستی قوڵبونەوەو ڕۆچوونی لە ناخی ئوممەتدا کە وەکو داینەمۆ تەکانی پێداو بە گەڕی خست، هەر ئوممەتێك (ئیسلام) نەخاتە دڵو دەروونیەوە، یان ئیسلام تەواو هەستو نەستی داگیر نەکات ئەوا هەرگیز ناتوانێت پرۆسەی بزوتنەوەیەکی ئاوا بەرفراوانو خێراو کاریگەر بە ئەنجام بگەیەنێ.[٣]

---

١ هەمان سەرچاوە (لا: ١٢٠).
٢ هەمان سەرچاوە (لا: ١٢١).
٣ هەمان سەرچاوە (لا: ١٢١).

یەکەم پڕوپاگەندەیەکی داخ لە دڵان سەبارەت بە ئەم بابەتە کە وەك قانگەلۆشکی بەر ڕەشەبا لەجێی خۆی هەڵدەقەنرێت‌و تارومار دەکرێت، ئەمەیە کە دەڵێت: داینەمۆی بزوتنەوەی فتوحاتی ئیسلامی بریتی بوو لە پاڵنەری ئابوری!!، بێگومان کەسێك بە هاندەری ئابوری بجولێتەوە ناچار نیە کە چووە دەرەوە بانگەشەی خەڵك بکات‌و داوای موسڵمانبوونیان لێ بکات‌و، ئەگەر بە دەم بانگەوازەکەیەوە هاتن‌و موسڵمان بوون چەکەکەی فڕێ بدات‌و چۆن دەستەملانێ لەگەڵ برای خۆی دەکات ئاوا دەستیان لە مل بکات‌و، ئەمجا بە مەبەستی ئەوە بیانکاتە برابەش لەو خێرە خوداییەی کە خودا پێی بەخشیوە بێت ڕێنماییەکانی ئیسلامیان فێر بکات، بێگومان ئەو بوختانکەرانەی خاوەنی ئەم پڕوپاگەندەیەن درۆ بە دەم مێژووەوە دەکەن.[1]

ئیدی دوابەدوای پوچەڵبوونەوەی ئەم بوختانە تەواوی پڕوپاگەندەکانی تریش وشکەکەڵەك ئاسا هەرەس دەهێنن‌و، ڕاستەقینەیەکی گرنگ دەمێنێتەوە، کە بریتیە لەوە: ئەم بزوتنەوەیە کە بەم بیچمە تێرو تەواوەیەوە لە گۆڕەپانی کرداردا خۆی خستەڕوو، دەبێت تەنها لە لایەن ئوممەتێکەوە جێبەجێ کرابێت: کە لە بواری دینداریەوە تەمامعەیار بوبێت‌و، داکۆکی لەسەر دین کردبێت‌و، ئیمانی پێ بوبێت‌و خۆشی ویستبێت‌و، حەزی بەوە کردبێت بە تەواوی بە ئاسۆکانی سەر زەمینیدا پەخش بکات، لێرەدا (هێز) بە تەنها پاڵەوانی ڕووداوە سەرسوڕهێنەرەکانی نێو بزوتنەوەکە نەبووە تا بە تەنها حیسابی بۆ بکرێت، حوکومەتە ملهوڕەکان هێزی زۆرو زەوەندیان لە پەلامارە فراوانخوازی‌و جیهانگیریەکانی خۆیاندا بەکارهێنا، بەڵام نەیانتوانی ئەو ئامانجانە بپێکن کە ئیسلام لە بزوتنەوەکەیدا پێکانی، دەگونجێت شمشێر زەمین داگیر بکات، بەڵام دڵەکانی پێ داگیر ناکرێن، ئامانج لە بزوتنەوەی فتوحاتی ئیسلامی بە تەنها فراوانخوازی نەبوو لە زەمیندا، بەڵکو بریتی بوو لە کردنەوەی دڵەکان تا ئیسلام قبوڵ بکەن، لە زۆربەی هەرێمەکاندا زمانی (دین) زمانی ڕەسمی بوو، گەلانی وڵاتە فەتحکراوەکان هەتا ئەوانەشیان کە لەسەر دینەکانی خۆیان مانەوە بەبێ زۆری لێکردن ئەو زمانەیان پشتگوێ خست کە پێش ئەمە لە کاروباری ڕەسمیاندا بەکاریان دەهێنا، خۆ ئەگەر فەتحکەران بە هەق موسڵمانی بە ئیمان‌و دیندار نەبوونایەو ئیمانداری‌و ڕەوشتبەرزی خۆیان لە میانەی هەڵسوکەوتەکانیاندا نەسەلماندبایە،

---

[1] هەمان سەرچاوە (لا: ١٢١).

ئــەوا هــەرگیزاو هــەرگیز ئــەم ســەرکەوتنە سەرســوڕهێنەرانەی نێــو فتوحــاتی ئیــسلامی نەدەهاتنەدی، شتێکی تـر کـە ڕاسـتەوخۆ پەیوەنـدی بـە خـودی سـوپاکەوە هەیـە، ئـەویش ئەمەیـە کـە زۆر جـار هـەبووە لـە ڕووی ژمـارەو چـەكو کەرەسـتەکانی جـەنگو شـارەزایی جەنگیەوە سوپای ئیسلام لە ئاست بەرانبەرەکەیدا قەبەتر نەبووە، بـەڵکو سـوپای بەرانبـەر (کە لە بەرانبەر سوپای ئیسلامدا تێك دەشـکا) ئـەم شـتانەی بـە زیـادەوە هـەبوون، ئەگـەر سوپای فەتحکەر دارای ڕەگەزێکی تری مەعنەوی نەبووایە ئەوا بـە هـیچ جۆرێـك نەیدەتوانی بەسەر ئەو دوژمنانەدا سەرکەوێت کە لە بواری تاکتیكو ژمـارەو کەرەسـتەی جەنگیـەوە زۆر لە ژوور ئەوەوە بوون، ئەو ڕەگەزە بریتی بوو لەو بیروباوەڕە زیندووە کە دڵو دەرون تێروپڕ دەکات ئێمەش لێرەدا کاتێك دەمانەوێت بـەرەنگاری هـەموو ئـەو پڕوپاگەندانـە ببینـەوە کـە دەڵێن: (لادانەکانی (بەنی ئومەییە) کۆتاییان بە ئەم دینە هێنا) داکۆکی لەسەر ئەم نیشانەیە دەکەینـەوەو، بـە پێویـستی سەرشـانی خۆمـانی دەزانـین لـە بەرانبـەر ئـەم خاڵـە چـەوتەدا هەڵوەستەیەکی دووروودرێژ بکەینو لـەنێو دەروونـی خوێندەوارانـدا ڕاسـتی بکەینـەوەو، ئـەم ڤایرۆسە پیسە-کە دەڵێت: ئیسلام لە دوای خیلافەتی ڕاشیدە کۆتایی پێهاتو بـونی نـەما- لە ناخیاندا ڕیشەکێش بکەبنو بیکوژین، ئەمەش بەو جۆرە دەبێـت کـە: (واقیعـی ئیـسلامی) بەوپەڕی تێرو تـەواویو پـڕ وردەکـاریو دەسـتپاکیەوە بخەینـەڕوو، ئیـدی بـە حیـسابو بـە هـەژمار کـۆی لادانـەکانو کـۆی ڕاسـتو ڕێکیـەکانمان بـۆ ڕوون دەبنـەوەو لەگـەڵ هـەبوونی لادانـیش خـەرمانێکی گـەورەی پـڕ سـەروەریو ڕاسـتو ڕێکـی دەبیـنین، ئیـدی دوای ئەمـە هەلێکی باشمان بۆ دەڕەخسێت، تا مەزەندەی مەزنایەتیو شکۆداری ئەم (دین)ە بکەین کـە چۆن ڕەگو ڕیشەی خۆی لە دڵو دەرونی نەوەی یەکەم بە تایبەتی (سەردەمی ئومـەوی)یـدا داکوتاو ئەو خەرمانە پڕ سەروەریەی پێ بەرهەم هێنانو، چالاکی کـردنو بوژاندنیـەوەو وای لێ کردن بەوپەڕی هەڵچونو داکۆکی کردنو گەرمو گوڕیەوە پەل بهاوێژنو دینی خودا لەسەر زەویدا بڵاو بکەنەوە.[1]

بەڵام سەبارەت بە ئاستی دابەزینو پلە نزمبونەوە، ئەوە بێگومان دەربارەی ژمارەیەك لە ئەندامانی کۆمەڵگە-ی ئەو کات-و هەرکەسەشیان بە ئاستی خۆی ڕووی دابوو، حەز دەکەی بڵـێ دەربـارەی زۆربـەیان ڕووی دابـوو، ئەمـە لـە خـودی خۆیـدا بـە لادان دانانرێـت، بـەڵکو

---

١ کیف نکتب التأریخ الإسلامي (ص: ١٢٢).

هاتنەدی ئەم واقیعە بە دیارنەمانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) لەنێو کۆمەڵگاداو کۆچی دوایی ئەو زاتەو ئاوابوونی کاریگەرییەکانی سەرەتای دروستبوون‌و سەرهەڵدان لە دەروونی خەڵکدا شتێکی چاوەڕوانکراو بوو.

ئێستا ئێمە قسە لەسەر ئەو سەردەمە ناکەین کە گۆڕانکاری هەرە گەورەی بە خۆیەوە بینی‌و لە جاهیلیەتەوە بەرەو ئیسلام هات، بەڵکو قسە لەسەرئەو سەردەمە دەکەین کە بە دوای ئەم قۆناغەدا هاتووە، بەڵام پێشەکی‌و با بە چاکی ئەو ستایش‌و مەتحە جوانە بخەینە بەرچاوو زەینی خۆمان کە لایەن پێغەمبەری خواوە دەرهەق بەم نەوەیەی سەردەمی فەرمووە: ((خيركم قرني ثم الذين يلونهم، ثم الذين يلونهم، ثم الذين يلونهم))[1] واتە: چاکترینتان نەوەی سەردەمی منن (واتە هاوەڵان)، ئەمجا ئەوانەن کە بە دوای ئەواندا دێن (واتە شوێنکەوتوان)، ئەمجا ئەوانەن کە بە دوای ئەواندا دێن، ئەمجا ئەوانەن کە بە دوای ئەمانیشدا دێن. کەواتە: ئێمە ئێستا هەر قسە لەسەر نەوە شکۆمەندو سەربڵندەکان دەکەین ئیدی دوای گەواهیدانی پێغەمبەری خوداش (ﷺ) قسەو گەواهیدانی کەس نایخوات.[2]

ڕاستە ئێستا ئێمە قسەمان لەسەر ئاستێکی ئاسایی ئیسلامە، بەڵام ئەم ئاستە خۆی لە خۆیدا زۆر بەرزە، هەر ئەوەندە نەگەیشتۆتە ئەو ئاستە هەرە بەرزەی کە نەوەی تاقانە-ی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)-ی گەیشتبوییە، بێگومان ئەگەر خەڵك پابەند بن-بەو ئاستە ئاساییەی ئیسلامەوە- ئەوان دەستکەوتگەل‌و خێرو بێرێکی هێند زۆرو بەفەڕیان دەستگیر دەبێت کە لە ڕێی هیچ ئاین‌و سیستەمێکی ترەوە دەستیان ناکەوێ.[3]

لە ڕاستیدا لەنێو کۆمەڵگەی (ئومەوی)یدا خەڵکانێك هەبوون لە ئاستی هەرە بەرزو شکۆداریدا مابوونەوەو پلەیەکیش دانەبەزیبوون، بەڵکو هیچ کامێك لە نەوەکانی ئوممەت- هەتا لە سەردەمەکانی شکست‌و نسکۆشدا- لە کەڵەمێردو پایەدارو خەڵکانی نموونەیی خاڵی نەبووە، بەڵام وەك دەبینین کۆمەڵبوونی خەڵکانی ئاوا نموونەیی تەنها لە سەردەمی یەکەمدا ڕوویداوە، ئیدی بەرەبەرەو بە تێپەڕینی کات کۆمەڵبونی ئەو جۆرە کەسانە کاڵبۆتەوە.[4]

درێژەپێدانی جیهاد لە سەردەمی (معاویە)دا شتێکی تازە داهێنراو نەبوو لە کارنامەی سیاسەتی ئەودا، ئەو بەهۆی شایستەیی‌و لێهاتوویی‌و چالاکیە جیهادیەکانی لە دەڤەری شام

١ البخاري.
٢ كيف نكتب التأريخ الإسلامي (ص: ١٢٣).
٣ المصدر نفسه (ص: ١٢٣).
٤ المصدر نفسه (ص: ١٢٣).

کە یەکێك بوو لە بەرە هەرە بەرفراوانەکانی جیهاد ناوو ناوبانگو جێگەو پێگەیەکی بەرزو فراوانی بۆ خۆی دەستەبەر کردبوو، هەر لە سەردەمی (أبوبکرو عمرو عثمان) (ڕەزای خوایان لێ بێت)دا ناوی بە موجاهیدێکی سەرکەوتوی هەردوو بەرەی وشکانیو دەریایی دەرکرد، فەتحە مەزنەکانی کەنارەکانی باکوری شام بەرهەمی جیهادی ئەو بوون، هەروەها دوای خودای بەرزو مەزن ئەو بوو بە هۆکاری دامەزراندنی هێزی دەریایی ئیسلامیو تێکشانی (ڕۆم) لە دەریاداو، داماڵینی پۆستی سەروەری لێیان بۆ یەکەمجار لە مێژووی موسڵماناندا.[1]

(جیهادکردن لە ڕێی خودا) لە ژیانی موسڵمانانی سەردەمی (ئومەوی)یدا بابەتی سەرەکی بوو، سەرکردایەتی ئیسلامی لە خۆشی دەستکەوتو تالآنی سوپاکانی بەرەو جیهادو فەتحی وڵاتان بەڕێ نەدەکردن، ئەگەر ئەم هەستە لە لای هەندێك کەسیاندا هەبووبێت بە ئاسایی وەردەگیرێت، سوپای پێغەمبەری خوداش (ﷺ) لەم جۆرە کەسانە خاڵی نەبوو: ﴿مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلْءَاخِرَةَ﴾ واتە: کەسانێکتان تێدان دنیایان گەرەکەو، کەسانێکیشتان تێدا هەن دواڕۆژیان دەوێ، تەبعەن ئەمە تەمسیلی تێڕوانینی موسڵمانان ناکات سەبارەت بە فتوحاتو، ڕەنگدانەوەی بۆچوونی سەرکردایەتیە فکریەکە نیە کە خۆی لە خەلیفەو سەرکردایەتی سوپادا دەبینێتەوەو سوپاش جێبەجێ دەکات، بە هەمان شێوەش بریتی نیە لە ڕاوبۆچوونی گشتی ئوممەتی ئیسلام.[2] بەشداری گەورە هاوەڵان لە جیهادی ئەو سەردەمەداو هاندانی موسڵمانان لە لایەن ئەوانەوە بۆ جیهادی ڕێی خودا، دەبێتە بەڵگەی ڕاستو دروستی ئەمەو ڕووداوەکانی جیهادو هەوڵو تەقەلای ئومەویەکان لە بەرەکانی جیهاددا زیاتر تیشك دەخەنە سەر ئەم ڕاستیە، بۆ وێنە: بەرەی غەزای ڕۆم کە بریتی بوو لە گۆڕەپانی نواندنی ئازایەتیو دەرخستنی شانو شەوکەتی پاڵەوانێتی، نەك هەر قازانجی ماڵی تێدا نەبوو، بەڵکو بەیتولماڵە بە دەست خەرجیەکانیەوە دەیناڵاندو زاکەی دەهات، چونکە سوپای ئیسلام لە هێرشەکانیدا بەرەوپێش نەدەچوو.[3] بە تایبەتی ئەگەر هێرشە سێ قوڵیە گەورەکەی سەر (قوستەنتینیە) بخوێنینەوە، دەبینین سامانێکی زۆرو زەوەندی تێدا خەرج کرا.[4]

---

١ الدولة الأموية، حمدي شاهين (ص: ٣٣٩).

٢ الفتوحات بين دوافعها الاسلامية ودعاوى المستشرقين (ص: ٨٧).

٣ الدولة الأموية، يوسف العشي (ص: ٣٤٦).

٤ المصدر نفسه.

لە ڕاستیدا موجاهیدانی سەردەمی ئومەوی وێنەگەلێكی جوانی قوربانیدان‌و پاڵەانێتی‌و دڵسۆزی نواندنی خۆیان بۆ خوداو دینەكەی نیشاندا، سەركردەكان‌و، میرەكان، سەربازەكان، كۆمەڵی زانایان‌و دنیانەویستان هەموو ئەو خوداپەرست‌و خوداترسانەی لە چەمكی پەرستنی (جیهاد) تێگەیشتبوون لەم بوارەدا یەكسان بوون‌و بە ئاراستەی بەدەستخستنی ڕەزامەندی خودا هەنگاویان هەڵدێناو، كارو چالاكی وا سەرسوڕهێنەریان نیشان دەدان كە ببنە پێشەنگی خەڵكانی دوای خۆیان، بەڵێ ڕەنگو ڕووی ئەم دڵسۆزی‌و فیداكاریە بەسەر هەموو بەرەكانی جەنگداو هەموو قۆناغەكانی جیهادەكەدا دابەش ببوو، بە شێوەیەك دەبێتە بەڵگەیەكی ڕوون‌و ئاشكرا لەسەر قووڵی بیروبۆچوونی ئیسلامیانەی بزوتنەوەی فتوحاتی سەردەمی ئومەوی‌و، ئەو پەردە ڕەش‌و تاریكەش لادەبا كە ناحەزانی شێوێنەر ویستوویانە بیخەنە سەر ڕۆشنایی هەموو ئەو دەستكەوتە مەزنانەی كە (دەوڵەتی ئومەوی)بە دەستی هێناون‌و لە مێژووشدا بە سونبولی شانازی‌و سەرفرازی تۆماركراون‌و هەموو ئەو گومانانەش دەتارێنێت كە لەسەر ئیسلامی بوونی فتوحاتی سەردەمی ئومەوی وروژێنراون.[1]

ئیتر بزوتنەوەی فتوحاتی ئیسلامی سەردەمی ئومەوی توانی ئامانجگەلێك بپێكێت‌و، دەستكەوتگەلێكی مێژوویش بۆ خۆی تۆمار بكات، بە چەشنێك (ئیسلام)ی گەیاندە ئاسۆ دوورەكان‌و بازنەی جیهانەكەی فراوان كردو لە ڕووی هێزی مرۆییشەوە دەوڵەمەندی كردو وێڕای ئەمە بوو بە پاسەوان‌و پارێزەرو دەوڵەمەندكەری هەموو ئەو دەستكەوتە مەزنانەش كە لە لایەن شەپۆلی یەكەمی بزوتنەوەی فتوحاتی ئیسلامی‌و بە سەركردایەتی‌و نەخشەی خەلیفە ڕاشیدەكان بەدەستهاتبوون، شەپۆلی دووەمی (بزوتنەوەی فتوحاتی ئیسلامی)یش لە سەردەمی (معاویە)دا دەستی پێكردو دواییش لە سەردەمی (وەلید)داو بە مەبەستی گەیشتن بە لوتكەی فراوانی درێژەی پێ درا.[2]

---

١ الدولة الأموية المفترى عليها (ص: ؟؟).

٢ في التأصيل الإسلامي للتأريخ (ص: ٩٢، ٩٣)، عمادالدين خليل.

## باسی یەکەم
## بزوتنەوەی جیهاد لە دژی دەوڵەتی (بێزەنتی)

(معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) چاکی دەزانی کە گەورەترین مەترسی بۆ سەر جیهانی ئیسلامی ئەو کات بریتیە لە (دەوڵەتی بێزەنتی)، هەرچەندە گەورەترین هەرێمی خۆی لە خۆرهەڵات -کە بریتی بوون لە (شامو مصر)- لە دەستدابوون، بەڵام لاشەی دەوڵەتو پایەتەختەکەی بە دەستلێنەدراوی‌و لە جێی خۆیاندا مابوونەوە، لە ئاسیای بچووکو ئەوروپاو ئەفریقیادا هەر بالادەست بوو، لە ڕووی هەردوو هێزی مرۆیی‌و مادیەوە زەنگین بوو، دەیتوانی بە باشی بەرگری لە خۆی بکاتو وازیشی لە دوژمنایەتی کردنی موسڵمانان نەدەهێنا، بە کورتی: (دەوڵەتی بێزەنتی) دوژمنێکی سەرەکی موسڵمانان بووو وەك گەورەترین مەترسیش لە بەرانبەریاندا ڕاست ببۆوە. (معاویە)ش پیاوی قۆناغی خۆی بوو لە ڕووی تێگەیشتنی ئەم مەترسیەو ئەندازەبۆگرتنی‌و ڕووبەڕووبوونەوەیدا بالادەست بوو، ئەو لە سەرەتای سەرهەڵدانی (فتوحات)داو لە سەردەمی (أبوبکری صدیق)دا لە (شام) بوو، دوایش بۆ ماوەی بیست ساڵێك بوو بە والی ئەو ولاتە، کە لەگەڵ (مصر) بە جوتە ببوونە هێڵی ڕووبەڕووبوونەوەی سەرەکی لەگەڵ دەوڵەتی بێزەنتیدا، (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) بە هۆی زۆر مانەوەی لە (شام)، توانی شارەزاییەکی بەرفراوانی وا لەسەر بارودۆخو سیاسەتو ئامانجەکانی دەوڵەتی بێزەنتی پەیدا بکات، کە پاش ئەوە بوو بە (خەلیفە) لە میانەی شێوازی هەڵسوکەوتکردنی گەڵ ئەواندا سوودی زۆری پێ گەیاند، لەبەر هەموو ئەمانە نابێت بە لامانەوە سەیر بێت کە دەبینین (معاویە) ڕاستەوخۆ بە خودی خۆی سەرپەرشتی سنووری دەوڵەتەکەی خۆی لەگەڵ ئەو دەوڵەتەداو پەیوەندیەکانی گەڵیدا دەکاتو زۆر بە بایەخەوە نەخشەیەکی سیاسی ڕوونو چەسپاو دادەڕێژێتو، خۆیو خەلیفەکانی (ئومەوی) دوای خۆی هەتا کۆتایی هاتنی دەوڵەتەکەیان پێڕەوی لێدەکەن، دەستگرتن بەسەر (قوستەنتینیە)ی پایەتەختی دەوڵەتی (بێزەنتی) ئامانجێکی سەرەکی نێو ئەو نەخشەیە بوو.[1]

---

١ العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ٢٤١).

## یەکەم: (معاویە)و (قوستەنتینیە):

دوای ئەوە (معاویە) لە ساڵی ٤١ك بوو بە خەلیفەی موسڵمانان، دەستی بە گەشەپێدانی کەشتیرانی دەریایی کرد، ویستی بەم هەنگاوەی توانایەکی وا پەیدا بکات تا بتوانێت سەنگەرو قەڵاو شورەکانی (قوستەنتینیە)ی پایتەختی (ڕۆم) بکوتێت‌و کۆتایی بەو هێزە شەڕەنگێزە بێنێت کە سەرچاوەی هێرش‌و پەلامارەو دوژمنێکی هەمیشەیی مەترسیدارە بۆ سەر موسڵمانان، (معاویە) لە یەکەم هەنگاویدا کۆتایی بە بزوتنەوە یاخیەکان (ی جوڕاجیمە) هێنا کە لە بەرزاییەکانی (تۆڕۆس)و چیای (لوکام) خۆیان قایم کردبوو، لەوێوە ببوونە ڕەسەدی (ڕۆم)و هەواڵی جموجۆڵی سوپای (ئیسلام)یان پێ ڕادەگەیاندن‌و خاڵە لاوازەکانی ئەو سوپایەیان بۆ دەستنیشان دەکردن.[1]

دوای ئەمە (خەلیفە) دەستی بە چالاکیە دەریاییەکان کردو،هەڵمەتە هەواڵگیریەکانی دەستپێکردن، یەکێك لەو هەڵمەتانە بە سەرکردایەتی (فوزاڵەی عەبیدی ئەنصاری) ئەنجام درا،[2] ئامانج لەم هەڵمەتە یەك لە دوا یەکانە بریتی بوو لە: وەرگرتنی هەواڵی ڕاست‌و دروست لەسەر وردەکاری جموجۆڵی هێزەکانی (ڕۆم)و بەرگرتن بەو هێزانە مەبادا دورگەکانی (قوبروس)و (ئەرواد)[3] و (ڕودس) بە مەبەستی ئامادەباشی‌و هێرشی سەربازی لە دژی کەشتیرانی ئیسلامی بەکاربهێنن، ئەمەو لە ساڵی ٤٣ کۆچیدا چالاکیە هەواڵگیریە دەریاییەکانی بە یەکێك لە (زستانە هەڵمەت)ەکانی بە سەرکردایەتی (بوسری کوڕی أبی ئەرتەئە) دەست پێکرد،[4] بە دوای ئەم هەڵمەتەو لە ساڵی ٤٦ کۆچیدا (زستانە هەڵمەت)ێکی تری بە سەرکردایەتی (مالکی کوڕی عبدالله) ناردە خاکی (ڕۆم)ەوەو لە ساڵی ٤٨ی کۆچیشدا (هاوینە هەڵمەت)ی (عبداللەی کوڕی قەیسی فەزاری) ناردە دەریاوەو، هاوکات لەگەڵ ئەمەداو هەر لە دەریادا هێرشێکی تری بە سەرکردایەتی (عقبەی کوڕی عامری جوهەنی) بە خەڵکی (مصر) ئەنجامدا.

---

١ العلاقات العربية البيزنطية في العصر الأموي (ص: ٥١).

٢ المصدر نفسه (ص: ٥١)، نقلا عن الأمويين والبيزنطيين.

٣ (ئەرواد): دوورگەیەکە کەوتۆتە نزیك (قوستەنتینیە)، یاقوت الحموی/ معجم البلدان (١/٢٠٧).

٤ مواقف الحاسمة (ص: ٣١)، محمد عبدالله عنان.

لە ساڵی ٤٩ی كۆچیشدا هاوینە هەڵمەتێكی بە (عبداللهی كوڕی كرزی بەجەلی)و هێرشێكی بە (عبداللهی كوڕی یزیدی شجری ڕەهاوی)و زستانە هەڵمەتێكی تریشی بە دانیشتوانی شام ئەنجام دا.[1]

ئـیتر چـالاكی هێـزە نیزامیـەكانی هاوینـەو زسـتانە بـەردەوام بـوونو (معاویـە) بەمـە ئامـانجێكی ڕوونـی ڕەچـاو كـرد كـە خـۆی لـە دەستبەسـەرداگرتنی (قوسـتەنتینیە)دا دەبینیـەوەو، دەیەویـست لـە ڕێـی ئـەم هەڵمـە یـەك لەسـەر یەكانەیـەوە فـشار بخاتـە سـەر دەوڵەتی بێزەنتیو ڕێ بۆ پێكانی ئەم ئامانجەی خۆش بكات، پێ دەچێت (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) ویستبێتی بە هۆی فەتحكردنی (قوستەنتینیە) دەوڵەتی بێزەنتی بڕوخێنێتو زانیبێتی كە پایتەختەكەیان مەڵبەندی شادەمارەكانی دەوڵەتو كۆگای هەردووك وزەی ماڵو مرۆڤەو، هەرچی خەڵكی ئاقڵو بیرمەندو بڕیـار بەدەسـتیان هـەن لەوێدا كۆبوونەتـەوە، جا ئەگەر دەستی بەسەر (قوستەنتینیە)دا گـرت ئەمـە سـەر دەكێشێت بـۆ لـە پەلوپۆكـەوتنی تەواوی دەوڵەتو، بۆ ئەمەش ئەزمونی موسڵمانەكانو دەوڵەتی (فارس)ی لەبـەر دەسـتدایە، كە چۆن دوای ڕووخانی (مەدائین)ی پایتەختیان تووشی شۆك بوونو قەڵەمی دەستو پێیان شكانو دەرەنجام بە یەكجاری شكانو سەرلەبەری دەوڵەتەكەیان لەنێوچوو و كەسـیان نـەما هەڵیانـستێنێتەوە ، جـا ئەگـەر ئـەمیش –واتـە (معاویـە)– تـوانی پایتـەختی بێزەنتیـەكان بڕوخێنێـت، ئـەوا یەكـسەر زەنگـی ڕووخـانی دەوڵەتەكەشـیان دەزرنگێتـەوەو، لـە بەرانبـەر دوژمنێكی سەرسەختو بەڵایەكی سـەرەكیدا پـشوی ئـارامی هەڵدەكێشێتو دەحەسێتەوە، لەبەر ئەمـەو بـۆ پێكـانی ئـەم ئامانجـەی لەسـەر هەوڵـەكانیو فـشارە یـەك لـە دوایەكـەكانی بەردەوام بوو، هیچ زێدەڕۆیی نیە كە بڵێین: دەوڵەتی بێزەنتی بە هۆی ئـەوە (قوسـتەنتینیە) پایتەختی بوو نزیكەی هەشت سـەدە لەسـەر ژیـانی خـۆی بـەردەوام بـوو، قـایمیو سـەختی شورەكانی ئەم شارەو خۆڕاگری دانیشتوانەكەی لە بەرانبەر پەلامارە یەك لەدوای یەكـەكانی (ئومەوی) بوو بە بەربەست لە نێوان ڕوخانی خۆیو لەنێوچوونی دەوڵەتەكەی، بەڵگە لەسـەر ئەمە ئەوەیە: كاتێك (سوڵتان محمد فـاتح)ی سـوڵتانی عوسمـانی لـە سـاڵی (٨٥٧ك/١٤٥٣ز) توانی فەتحی (قوسـتەنتینیە) بكـاتو دەسـتی بەسـەردا بگرێـت، زەنگێـك بـوو بـۆ ڕووخـانی دەوڵەتی بێزەنتیو سڕانەوەی لە نەخشەی بووندا.[2]

---

١ النجوم الزاهرة (١٣٤/١)، العلاقات العربية والبيزنطية (ص: ٥١).

٢ العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ٢٤٤).

## دووەم: نەخشە ستیراتیژیەکەی (معاویە) بۆ دەستەبەسەرداگرتنی (قوستەنتینیە):

دەوڵـەتی (بێزەنتـی) بـەردەوام کۆمـەکی دورگـەکانی خۆرهـەڵاتی دەریـای ناوەڕاسـتی دەکـردو، هێـزی سـەربازی‌و چـەك‌و چـۆڵی بـۆ بەڕێـدەکردن‌و هـانی دانیـشتوانەکانی دەدان پەلاماری کەناری (مصرو شام) بدەن، لەبەر ئەمە (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) سووربوو لەسەر ئەوە هەمیشە جڵەوی دەستپێشخەری لەدەست خۆیدابێت‌و، لە حاڵەتی ئامادەباشی‌و گورزەوەشاندندا بێت، بە خاتری هێنانەدی ئەم ئامانجە چەند ڕێبازێکی گرتەبەر:

١ـ بایەخدان بە کـەرتی پیـشەسازی کەشـتی لـە (مـصرو شـام)و هەڵبـژاردنی شـارەزترین‌و شارەزاترین وەستای ئەم بوارەو، هەڵڕشتنی کـرێ‌و بەخشـشی زۆر بەسـەریاندا تـا ئەوپـەڕی هەوڵی خۆیان لەم بوارەدا بەگـەڕ بخـەن.[١] (معاویـە) (ڕەزای خـوای لێ بێـت) بـەو شـارەزاییە سەربازیەو دووربینەی هەیبوو، هەستی بەوە کرد کە لەمەولا جەنگی نێوان موسـڵمانان‌و ڕۆم پشت بە لایەنی کەشتیرانی دەبەستێت، ئەو کاتەش ڕۆم خۆی کـۆکردەوەو لـە جـەنگی (ذات الصواري)یدا بە بەکارهێنانی زیاتر لە پێـنج سـەد کەشـتی هێرشـی هێنایـە سـەر کەشـتیرانی ئیسلامی، ئەم هەستە بە شێوەیەکی زیـاتر لـە بیروهۆشـی (معاویـە)دا پەیـدابوو، هەرچـەندە (ڕۆم) لەم جەنگـەدا شکـستی گـەورەیان خـوارد، بـەڵام کۆڵیـان نـەدەداو هـەر دەیانەویـست هێزەکانیان ئامادە بکەن‌و لە ڕێی دەریاوە هێرش بکەنە سەر موسڵمانان، ئەوان وایانـدەزانی لەبەر ئەوە هێزی دەریایی ئیسلامی تازە دروست بووەو هێشتا بە تەواوەتی پێنەگەیشتووە، کەواتە دەتوانن لەنێوی بـەرن، بـەڵام لـە شکـستەکەی هێرشـی (ذات الـصواري)یانـدا واقیـان وڕما، ئیتر دوای ئەمە بەهۆش هاتنەوەو پێشبینی ئەوەیان کرد کە لەمـەولا جـەنگی داهـاتوو دەکەوێتە دەورەی شورەو قەڵاکانی (قوستەنتینیە)ی پایتـەخت، لەبـەر ئەمـە دەسـتیان بـە خۆئامادەکردن دەکرد.[٢]

هاریکاری دوقۆڵی (مصرو شام) لە پیشەسازی (کەشتی)یدا ئاکامێکی نایابی لێ کەوتەوە، لە (شام)دا تەختەی (دار سنۆبەری بەهێزو بەڕووو عەرعەڕ)ی زۆر هەبوو کە بۆ دروسـتکردنی کەشـتی گونجـاو بـوون، لـە (مـصر)یـش ئـەو جـۆرە تەختـە دارانـە زۆر هـەبوون کـە بـۆ لاتەنیـشتەکانی کەشـتی‌و ئـەو کۆڵەکـە بەرزانـە گونجـاو بـوون کـە لـە نێوەڕاسـتیەوە

١ العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ٢٤٥).
٢ الأمويين، محمد سيد الوكيل (١/١٥٤).

بەرزدەکرانەوەو گوریسیان پێدادەکرانو تەختەی درەختی (لەبخو دوم)یشی زۆر بوون کە بۆ دروستکردنی سەڵبەی کەشتی گونجاو بوون،[1] هەروەها (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) ئاسنی لە پیشەسازی (بزمارو لەنگەرو چادرو تەشۆی)دا بەکاردەهێنا، کە کانەکانی ئەم مادە لە (مصرو شامو یەمەن)دا زۆر بوون، هەروەها لە (مصر) مادەی (قەتران) فرەبوو بۆ پڕکردنەوەو پێکەوەلکاندنی تەختەکانی کەشتییان بەکاردەهێناو، ڕووەکی (قس)یش زۆر بوو کە گوریسی کەشتیان لێ دەهۆنینەوە، بە کورتی: هاریکاری دووقۆڵی (شامو مصر) سەری کێشا بۆ گەشەسەندنی لایەنی دەریاوانی ئیسلامیو، دوای ئەوە (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) لە ساڵی ٥٤ك فەرمانی بە (مسلمتی کوڕی مخلدةی ئەنصاری) والی (مصر) کرد خانوبەرەیەك لە دورگەی (ڕەوزە) بۆ تێدا دروستکردنی کەشتی دروست بکات، زیاتر گرنگی ئەمە دەرکەوت،[2] بە تایبەتی دوای هێرشێك کە لە لایەن (بێزەنتی)یەکانەوە کرایە سەر وڵاتی مصر.[3]

٢ـ بەهێزکردنی سەنگەرە دەریاییەکانی (مصرو شام):

معاویە (خوا لێی ڕازی بێت) ئەرکی قایمکردنی شارە کەنارییەکانو زۆرکردنی هێزی سەربازی تێیاندا خستە پێش هەموو کارەکانیەوەو کردنی بە بنکەی سەرەکی تێداڕاگواستنی هێزەکانی سوپا بە دەریادا، بۆ هەر شوێنێك خواستی لەسەر بێت، سیستەمێکی بۆ ئەو شارانە دانا کە (رباط)ی پێ دەگوترا، مەبەست لە (رباط) ئەو شوێنانە بوو کە سەربازانو سوارانی سوپای تێدا کۆدەبوونەوە، لەوێدا خۆیان بۆ هێرشکردنە سەر خاکی دوژمن سازدەکرد، بە چەشنێك بایەخ بەم سیستەمە درا تا ئەوەی بوو بە بەشێکی پەیوەندیدار بە (جیهاد)ەوەو، ئیتر تەقواکارانو هەموو ئەوانەی لە بواری بەهێزکردنو سەرخستنی (ئیسلام) کاریان دەکرد پەیوەندیان بە (رباط)ەوە دەکرد.[4] (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) بەو شێوازەی کە لە ئەنجامدانی تەواوی کارەکانی تریدا بەوپەڕی وردبینیو دووربینیو دووربوون لەسەرپێیو هەڵچون ناوی دەرکردبوو، ئیدی هەمان شێوازیشی لە پشتگیریو کۆمەککردنی ئەم سیستەمەدا پەیڕەوکرد، ئیتر بارەگاکانی (رباط)ی

١ تأريخ الدولة العربية (ص: ٣١٢).
٢ العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ٢٤٦).
٣ كتاب الولاة والقضاة للكنيدي (ص: ٣٨).
٤ الأمويون والبيزنطيون (ص: ٦٨).

ئامادەکردن، هەتا ببن بە چەند قەلایەك سەربازان تێیاندا کۆوەبن‌و بەرگری لەو ناوچانە بکەن کە ببوونەئامانجی هێرشی دەریایی بێزەنتیەکان، هەروەها هەتا لە کاتی پەلامارە چاوەڕوانکراوەکانی هێزە دەریایی‌و کەشتیە سەربازیەکانی دەوڵەتی بێزەنتیدا ببن بە پەناگای دانیشتوانی ناوچە کەناریەکان، هەر قەلایەك لە (رباط)دا پێکهاتبوو لە چەند ژوورێکی سەربازی‌و جێ تێدا حەوانەوەیان‌و، چەند کۆگایەکیش چەك‌و چۆڵ‌و خواردەمەنی‌و بورجێکی چاودێری، ئیتر هێندەی نەخایاند پەرەی پێ دراو زیاتر بایەخی زانرا، تا ئەوەی بوو بە بنکەیەکی سەرەکی هێرش‌و پەلاماری سەربازی.[١] دابەشکردنی زەوی ناوچە کەناریەکان بەسەر خەڵکدا دواپلەی پەیژەی ئەو سیاسەتە دەریاییە بەرگریە بوو کە لە لایەن (معاویە)وەو پێش ڕۆیشتنە نێو دەریاوەو لە سەردەمی (عثمان) (ڕەزای خوای لێ بێت)دا نەخشەی بۆ کێشرابوو، ئیدی بە هۆی بەخشینی ئەم پارچە زەویانەوە، توانرا چەند بنکەیەکی دەریایی ئامادە بکرێن‌و کەشتیگەلیان تێدا دانێ، بە ڕاگواستنی چەند کۆمەڵە خەڵکێك لە دانیشتوانی (بەعلەبەگ‌و حمص)ەوە بۆ شارە کەناریەکانی (مصرو عەککاو هی تریش) لە ساڵی ٤٢ کۆچیدا ئەم شارە کەناریانە بوژانەوەو گەشانەوە، هەروەها (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) قەلای ئەم دوو شارەی چاك کردنەوەو، دەستی ئاوەدانکردنەوەو گرنگیدانی بۆ تەواوی شارە کەناریەکان درێژکردو، لە قەلای (عەکا)وە یەکەمین پەلاماری دەریایی خۆی بۆ سەر (قوبرص) ئەنجام دا.[٢]

٣ـ دەستبەسەرداگرتنی دورگە هەڵکەوتوەکانی لای خۆرهەڵاتی دەریای نێوەڕاست:

پێشدا دەستی بە دەستبەسەرداگرتنی دورگەی (قوبرص)کرد –وەکو لە پێشدا باسکرا– ئەمجا دورگەیەکی گرنگتری گرت بە ناوی (ڕودس)ەوەو، فەرمانی کرد قەلایەکی قایمی تێدا دروست بکرێت‌و کۆمەڵێك لە موسڵمانانی ناردن بەرگری لێ بکەن‌و ئیتر کردی بە (رباط)ێك تا لەوێوە ڕێگری شالاوەکانی سەر (شام)ی پێ بکەن، ئەمەو (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) بڕیاری دا کەشوهەوایەکی سازگار لەنێو موسڵمانانی (ڕودس)دا دروست بکرێت‌و ئالای ئیسلامی بەبەرزی تێدا بشەکێتەوەو، مامۆستایەکی شەرعزانی بەناوی (مجاهدی کوڕی جبر)ی بۆ لا ناردن تا وانەی (قورئان)یان پێ بڵێ.[٣]

---

١ الأمويون والبيزنطيون (ص: ٦٩).

٢ المصدر نفسه (ص: ٧٠).

٣ المصدر نفسه (ص: ٨١).

(معاويه) (ڕەزای خوای لێ بێت) ویستی هەڵمەتە یەك لەدوایەکەکانی پەرە پێ بداتو ڕێگا سەرەکیەکانی دەریای (ئیجە) بەڕووی کەشتیە بێزەنتیەکاندا دابخاتو نەیەڵێ بگەنە وڵاتانی ئیسلامی، بە جیددی کاری لەسەر پێکانی ئەم ئامانجەی کردو ویستی لەڕێی دەستبەسەرداگرتنی دورگەی (کریت) -کە بە تەواوەتی بەسەر دەریای (ئیجە)یدا دەڕوانی- ئەم ئاواتەی بێنێتەدی، شێوەی دەریاکە کە بە دورگەکە دەگات وەکو زارکی کوندە وایەو، دورگەکە لەوێوە بە ماوەی (١٦٠) میل درێژ بۆتەوەو، زاری دەریاکە دەکات بە دوو بەشەوەو بە تەواوەتی بەسەر هەردووك دەروازەکەدا دەڕوانێت، ئیتر (معاويه) هەمان هێزی سەربازی کە دورگەی (ڕودس)ی فەتح کردبوو، بە سەرکردایەتی (جنادەی کوڕی ئومەییەی ئەزدی) بە مەبەستی فەتحکردنی ئەو دورگە گرنگەو گرتنی ڕێگە سەرەکیە دەرياییەکانی بەردەم پەلاماری هێزە بێزەنتیەکان بۆ سەر (شام) بەڕێ کرد، بەڵام سوپای هێرشبەر بە هۆی گەورەیی‌و فراوانی دورگەکە نەیتوانی فەتحی بکات، بەڵکو بە پەلامارێکی خێرا بۆ سەری‌و گورز وەشاندنێك لە بێزەنتیەکان‌و کەشتیەکانیان وازی هێنا، بەم شێوەیە (معاويه) (ڕەزای خوای لێ بێت) کارێکی وای کرد موسڵمانان چاویان ببڕنە دەریای سپی ناوەڕاستو لە بەرانبەر گرنگی دورگەکانیدا ڕاپگرن‌و بە گوێرەی توانای کەشتیە جەنگیەکانی توانی ژمارەیەك لەم دورگانە فەتح بکاتو، لە دەرگای دورگەکانی تریشی داو، ڕێگای بۆ هەموو ئەو خەلیفە ئومەویانە خۆش کرد کە بە دوای خۆیدا دێن تا کۆڵ نەدەن‌و فەتحیان بکەن، (معاويه) هێزێکی دەریایی وای بۆ موسڵمانان دەستەبەر کرد کە کێبەرکێی بێزەنتیەکان‌و سەروەری لەمێژینەی ئەوانی دەکرد بەسەر دەریای سپی ناوەڕاستدا، ئەمجا بە خاتری ئەنجامدانی گرنگترین کاری مێژوویی خۆی کە بریتی بوو لە لێدانی پایتەختی بێزەنتیەکان‌و دەستبەسەرداگرتنی بەهێزو پڕچەکی کرد، بەڵام (معاويه) (ڕەزای خوای لێ بێت) سەبارەت بە ئەنجامدانی ئەم ئامانجەی دوایەی -واتە دەستبەسەرداگرتنی (قوستەنتینیە)- تاڵوکەی نەکرد، چونکە دەیەویست پێش ئەمە لە بواری هێزو دەسەڵاتی دەریاییدا لە بێزەنتیەکان دەستپێشتوو و باڵادەستتر بێت.[1]

٤ـ لە پێناوی ئەوەدا ئامادەباشی هێزە دەرياییەکانی سوپای ئیسلام بەرهەمیان هەبێتو ئامانجەکانیان بە دروستی بپێکن، بەڵێ هاوکات لەگەڵ ئەمەدا پێویست بوو قەراغەکانی باکووری شام -کە بریتی بوون لە ناوچە سنوریەکانی نێوان دەوڵەتی ئیسلامی‌و بێزەنتی-

---

١ الأمويون والبيزنطيون (ص: ٨٢).

لە لایەکەوە لە بەرانبەر ئەگەری پەلاماری بێزەنتیەکان قایم بکرێنو لە لایەکی تریشەوە بکرێنە پاڵپشتێکی سەرەکی هێزە هێرشبەرەکانی ئیسلام بۆ سەر دەوڵەتی بێزەنتی، شیاوی باسە موسڵمانەکان لە سەردەمی خەلیفە ڕاشیدەکانداو لە میانەی فتوحاتەکانیاندا گەیشتبوونە قەراغەکانی باکوری شامو زنجیرە چیای (تورۆس) لەبەر دەمیاندا قیت بۆوەو بەهۆی ئەمە نەیانتوانی بگەنە (ئاسیای بچوك)ی بێزەنتی، بێزەنتیەکان لە کاتی پاشەکشەکردنو شکستیان لە بەرانبەر سوپای ئیسلامدا بۆ ئەوەی موسڵمانەکان سودیان لێ نەبینن خانوبەرەی ناوچەکانی باکوری (حەلەبو ئەنتاکیە)یان ڕوخاندنو زۆربەی قەڵاکانی نێوان (ئەسکەندەریەو تورۆس)یشیان ڕماندن،[1] لەبەر ئەمە معاویە بە پێویستی زانی بایەخی تەواو بەم ناوچانە بداتو ئاوەدانیان بکاتەوەو بە قەڵاو شورەی چاك قایمیان بکات، یەکەم جار گرنگی بە (ئەنتاکیە)دا کە هەمیشە ڕووبەڕووی پەلامارە لە ناکاوەکانی دەوڵەتی بێزەنتی دەبۆوەو، لە ئاوەدانکردنەوەیدا پێڕەوی لەو سیاسەتەی کرد کە بۆ ئاوەدانکردنەوەی شارە کەناریەکانی شام ڕەچاوی کردبوو، تەماعی دەخستە بەر خەڵكو پارچە زەوی پێ دەدان تا لە (ئەنتاکیە) نیشتەجێ ببنو ئەو (رباط)ە تایبەتەی بەهێزکرد کە بۆ بەرگری لێکردنی ئەوانی تەرخانکردبوو، ئیتر لە میانەی هێرشە سەربازیەکانی بۆ سەر خاکی بێزەنتیەکان (معاویە) یەك بە دوای یەك شارە هەڵکەوتووەکانی نێوان (ئەسکەندەرونەو طەرسوس)ی ئاوەدانکردنەوە، تا کار بەوە گەیشت نێوانە سنوریەکانی وڵاتی شام گەیەندرانە پەنا چیای (طوروس) -کە وەك بەرزەکێك شامو ئاسیای بچوکی لێك جیاکردبۆوە-، هەروەها بە خاتری قایمکردنی هێزەکانی لەنێو سەنگەرو قەڵا هەڵکەوتوەکانی سەر سنوری (ئیسلامی بێزەنتی)و باڵادەستبوونی تەواوی بەسەریاندا، دەستی بەسەر (سمیساط و مەڵەتیە)دا گرتو چەند قەڵایەکی تری وێنەی (مەڕعەشو حەدەس)ی نۆژەن کردنەوەو ئەمجا قەڵای گرنگی (زەبتەڕە)ی داگیرکردو سەر لە نوێ چاکی کردەوە.[2]

لەپێناو بەردەوامبوونی بزوتنەوەی فتوحاتو کردنی ناوچە سنوریەکان بە گۆڕەپانی مەشقی سەربازانی سوپای ئیسلامو، ڕاهێنانو خاراندنیان لەسەر هاتوچۆکردن بەنێو شاخو چەقەنو ڕێبازو ڕەوەزە سەختەکانی چیادا، (معاویە) پێداگیری لەسەر غەزای بەردەوام

---

١ فتوح البلدان (ص: ١٩٤)، للبلاذري، العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ٢٤٧).

٢ الأمويون والبيزنطيون (ص: ١١٠)، نقلا عن العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ٢٤٧).

دەکرد، ئەم چالاکیە سەربازیانە بە (هاوینە غەزا)و (زستانە غەزا) ناسران.[١] کاتێك (الطبري)و مێژوونووسەکانی تریش باسی ڕووداوەکانی سەردەمی خیلافەتی (معاویە) دەکەن، دەبینین باسی جەنگێکی ئەو چ لە وشکانی چ لە دەریادا دەکەن، وەکو ئەوە دەڵێن: لەم ساڵەدا فڵانە کەس زستانە غەزایەکی لە خاکی (ڕۆم)دا ئەنجامدا، یان زستانە غەزای فڵانەکەسیش لەم ساڵەدا ڕوویدا.[٢]

ئەم (هاوینە غەزاو زستانە غەزا) یانە زیاتر بە جەنگی پارتیزانی ئەم سەردەمە دەچوون‌و، موسڵمانەکان هەڵیاندەکوتایە سەر وڵاتی دوژمن‌و قەڵاو شوورەکانیان لێ دەڕوخاندن‌و بە دەستی پڕو دەستکەوتی زۆرەوە دەگەڕانەوە، بەردەوامبوونی ئەم جەنگانە گوشاریان دەخستە سەر دەوڵەتی بێزەنتی‌و مێشکیان هاڵۆز دەکردو سوپاکەیان شڕ دەکرد،[٣] ژمارەیەك لە گەورە سەرکردەکانی سوپای ئیسلام فێری هونەری ئەم جۆرە جەنگانەبوون‌و لەم گۆڕەپانەدا ئەسپی خۆیان تاوداو ناوو ناوبانگیان دەرکرد، وێنەی: (عبداللهی کوڕی کرزی بەجەلی،یەزیدی کوڕی شەجەرە ڕەهاوی، مالکی کوڕی هەبیرەی سکونی، جەنادەی کوڕی ئومەوی ئەزدی، سوفیانی کوڕی عەوف، فوزاڵەی کوڕی عەبید)،[٤] (مالکی کوڕی عبداللهی خەثعەمی)یش بە حوکمی باڵادەستبوونی لە گۆڕەپانی جەنگی ئاسیای بچوکدا ناوی (مالك الصوائف= خاوەنی هاوینە غەزاکان)ی لێنرابوو،[٥] بە ڕاستی ئەم سەرکردانە ئەزمونێکی جوانی جیهادیان لە دژی بێزەنتیەکان‌و بە خاتری بەرزکردنەوەی وشەی خوداو شەکانەوەی ئاڵای ئیسلام نیشاندا.[٦]

## سێیەم: یەکەمین گەمارۆی سەر (قوستەنتینیە):

ساڵی ٤٧و ٤٨ك (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) بە مەبەستی خۆشکردنی ڕێگای گەیشتن بە (قوستەنتینیە) چەند سریە سەربازێکی ئامادەکردن‌و هێرشێکی پێکردنە سەر خاکی دەوڵەتی بێزەنتی، ئەمەو (مالکی کوڕی هەبیرەی سکونی) بە خۆیو سریەکەیەوە وەرزی زستانی لە نێو خاکی دوژمندا بەڕێ کرد.[٧] بە هۆی سەرکەوتنی هێزەکانی ئیسلام لە چوونە

---

١ العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ٢٤٧).

٢ تأريخ الطبري (٦/٢٢٥).

٣ العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ٢٤٨).

٤ تأريخ الطبري، نقلا عن العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ٢٤٨).

٥ الأمويون والبيزنطيون، نقلا عن العالم الاسلامي (ص: ٢٤٨).

٦ العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ٢٤٨).

٧ تأريخ الطبري (٦/١٤٥)، خلافة معاوية للعقيلي (ص: ١٠٨).

نێو جەرگەی خاکی بێزەنتیەوەو هەڵگەڕانەوەی هەردووك سەرکردە (سیلیوس‌و میزیوس) لە (قوستانزی دووەم)ی ئیمپراتۆری ڕۆم‌و بەرپابوونی ململانێ لەنێو ئیمپراتۆریەتەکەیدا، ئەوا ساڵی ٤٩ك/٦٦٩ز یەکەمین گەمارۆی ئیسلامی خۆی بەسەر (قوستەنتینیە)وە نیشاندا.[١]

هەموو ئەمانە هاریکاری (معاویە)یان کرد تا هێزەکانی خۆی بە سەرکردایەتی هەریەك لە (فوزاڵەی کوڕی عەبیدی لەیسی)و (سوفیانی کوڕی عەوفی عامری)ی بە هاریکاری (یەزیدی کوڕی شەجەرەی ڕەهاوی) لە باری وشکانی‌و دەریاییەوە بەرەو (قوستەنتینیە) بەڕێ بکات.[٢]

ئەمەو کەشتیرانی ئیسلامی گەیشتە (خەلقیدونیە)-کە لە باری وشکانی ئاسیاوە- یەکێك بوو لە ئاوایییەکانی (قوستەنتینیە)، سەرەتا وەکو ڕێ خۆشکردنێك بۆ گەمارۆدانی پایتەخت‌و پاشانیش وەکو هەوڵدانێك بۆ دۆزینەوەی کەلێنێك تا لەوێوە خۆی بەنێودا بکات (خەلقیدونیە)ی گەمارۆدا، بەلام سەرهەڵدانی نەخۆشی (گرانەتاو کۆخەوهەلامەت)و تەشەنەکردنی لەنێو سەربازانی سوپای ئیسلام بە شێوەیەکی بەربڵاوو هاتنەپێشەوەی وەرزی زستان‌و توندی سەرماو سۆڵەکەی بارودۆخی سوپای گەمارۆدەری یەکجار قورس کرد، کاربەوە گەیشت (فوزاڵەی کوڕی عەبیدی لەیسی)ی سەرکردەی سوپای وشکانی هاوار لە (معاویە) ببەستێ‌و داوای لێ بکات بە هێزی زیاتر بە هانایەوە بێت، جا (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) سوپایەکی بۆ بەڕێکرد کە لە نێویدا ژمارەیەك لە هاوەڵان هەبوون، وێنەی: (عبداللەی کوڕی عمر، عبداللەی کوڕی زوبێر، عبداللەی کوڕی عمروی کوڕ عاص، أبو أیوب خالدی کوڕی یەزیدی ئەنصاری (ڕەزای خوایان لێ بێت))،[٣] (یەزیدی کوڕی معاویە) سەرکردەی ئەم سوپایە بوو، کاتێك گەیشتە (خەلقیدونیە) لەگەڵ سوپای سەنگەرگرتووی ئیسلام یەکی گرت، ئەمجا هەموویان بەرەو (قوستەنتینیە) داکشان‌و لە پشت شورەکانیەوە سەنگەریان گرت‌و، ماوەی شەش مانگی تەواوی هەردووك وەرزی بەهارو هاوین گەمارۆیان داو، جاروبار شەڕو پێکدادان لە نێوان هێزەکانی هەردوو سوپادا ڕووی دەداو، لەم میانەدا (یەزید) ڕۆڵێکی کاریگەری گێڕاو جیهادێکی چاکی ئەنجام داو جۆرە ئازایەتی‌و نەبەردیەکی وای نیشاندا تا ئەوەی مێژوونووسان بەم بۆنەوە شۆرەتی (لاوچاکی عەرەب)یان پێوە

١ (ابراهيم العدوی) ئاماژە دەدا کە (ئیمراطۆر) کوژراو (قوستەنتینی چوارەم)ی کوڕی جێی گرتۆتەوە.
٢ تأريخ الطبري (١٤٨/٦).
٣ تأريخ الطبري (١٤٨/٦).

لکاندووە.[١] ئەگەر سوپای ئیسلام ڕووبەڕووی چەند ئاستەنگێك نەبایەوە هێندەی نەمابوو سەرکەوتن تۆمار بکات، لە ڕستەی ئەو ئاستەنگانە: بارانی زۆری زستانەو سەرماو سۆڵە سەری کێشا بۆ کەمبونی خواردەمەنی، نەخۆشی لە نێویاندا بلاوبوۆوە، هەروەها قایمیو مەحکەمی شوراو قەلاکانی (قوستەنتینیە) کاریگەری خۆی هەبوو لەسەر پاشەکشەی سوپای ئیسلامو ناچاربوونی بۆ گەڕانەوە بۆ شام.[٢] ئەو ئاگربارانەی لە لایەن قەلانشینەکانەوە دەکرایە سەر سوپای ئیسلام کاریگەرترین هۆکار بوو لەسەر پەکخستنی پرۆژەی فەتحی ئەو شارە، ئەم ئاگربارانە خەڵکێکی زۆری لە سوپای ئیسلام سوتاند.[٣]

(جەنگی قوستەنتینیە) بە یەکێك لە نیشانەکانی پێغەمبەریتی (دلائل النبوة) دەژمێردرێت، پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی: ((أول جیش من أمتي یغزون مدینة قیصر مغفور لهم))[٤] واتە: یەکەمین سوپای ئوممەتی من جەنگی شاری قەیسەر-ی ڕۆم- دەکەن، لێبوردراون. لە ڕاستیدا ژمارەیەك لە گەورە هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێ بێت) بە مەبەستی بەدەستخستنی ئەو لێخۆشبوونەی لە لایەن پێغەمبەری خودا (ﷺ) مـوژدەی لەسەر دراوە بەشداری جەنگی (قوستەنتینیە)یان کرد.[٥]

## چوارەم: کۆچی دوایی أبوأیوبی ئەنصاری لە کاتی گەمارۆدانی (قوستەنتینیە)دا:

ئەو (خالدی کوڕی زیدی کوڕی کلیب)ەو بە (ئەبو ئەیوبی ئەنصاری خەزرەجی) ناسراوە، ئامادەی جەنگی (بەدر)و پەیمانی (عەقەبە)و تێکڕای ڕووداوەکان بووەو، لەگەڵ (عەلی) (ڕەزای خوای لێ بێت)دا بەشداری جەنگی (خەواریج)ی کردووە، کاتێك پێغەمبەری خودا (ﷺ) تەشریفی هاتە (مەدینە) بە میوانی لە ماڵی ئەودا دابەزی، هەتا لە دروستکردنی مزگەوتو خانووەکانی بۆوە -کە ماوەی مانگێکی خایاند- لە ماڵی ئەودا نیشتەجێ بوو، ئەمجا ماڵەکەی بۆ خانووی خۆی گواستەوە.[٦] (عبداللەی کوڕی عەباس) لە سەردەمی (عەلی)یدا والی (بصرە) دەبێ، (ئەبو ئەیوب) سەردانی دەکات، (عبداللە) ڕێزێکی زۆری لێ

---

١ الأمویون والبیزنطیون (ص: ١٦٤)، خلافة معاویة (ص: ١٠٩).
٢ الکامل في التأریخ (٦/٤٨٠)، خلافة معاویة للعقیلي (ص: ١٨٠).
٣ الأمویون، محمد سید الوکیل (١/٥٩).
٤ البخاري، صحیح البخاري مع فتح الباري (٦/١٢٠).
٥ مرویات خلافة معاویة في تأریخ الطبري (ص: ٣٢٠).
٦ البدایة والنهایة (١١/٢٥١).

دەنێتو پێی دەڵێت: دەبێ لە بەرانبەر میوانداریکردنت لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) میواندارییەکی وات بکەم پاداشتت بدەمەوە، ئەوەی لەماڵدا هەیبوو پێی بەخشی (کە بڕی چل هەزار درهەم بوو)،[١] بە گوێرەی ڕیوایەتێکی تر: کاتێک ویستی بڕواو خواحافیزی لێ بکات، هەرچی لە ماڵ هەیبوو پێی داو، چەندین دیاری بە نرخو ژمارەیەک خزمەتکاری پێ بەخشیو چل هەزار درهەمو چل کۆیلەی پێدا، هەموو ئەم ڕێزگرتنە لە بەرانبەر ئەوەدا بوو ماوەیەک لە ماڵی خۆیدا خانەخوێی پێغەمبەری خودا (ﷺ)، دیارە ئەمەش گەورەترین پلەوپایەی شەرەف بوو کە دەستی کەوتبوو.[٢] (ئەبو ئەیوب) ئەو کەسە بوو کاتێک (ئومو ئەیوبی) هاوسەری ڕووی قسەی تێکردو پێی وت: ئەوە گوێت لێ نیە خەڵك سەبارەت بە عائیشە چ دەڵێن؟ واتە سەبارەت بە بوختانەکە (ئیفك)، (ئەبو ئەیوب) لە وەڵامدا پێی وت: هۆ (ئومو ئەیوب) تۆ کاری ئاوا لە خۆت دەوەشێنیتەوەو دەیکەی؟ وتی: نە بە خوا، (ئەبو ئەیوب) وتی: دە بە خوا ئەو زۆر لە تۆ چاکو پاکترە، جا خودا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە:[٣] ﴿لَّوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا﴾[٤] واتە: خۆزگە گوێتان لێ دەبوو کە ئیماندارانی پیاوو ژن چۆن گومانی باشیان بە خۆیان دەبرد-و ئەو بوختانەیان بەرپەرچ دەدایەوە-.

پێغەمبەری خودا (ﷺ) برایەتی لە نێوان (ئەبوئەیوب)و (موصعەبی کوڕی عومەیر)ی[٥] پاڵەوانی فەتحە گەورە ئاشتیەکەی شاری (مەدینەی مونەوەرە) دروست کرد (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، لە وڵاتی (ڕۆم)و لە نزیك شورەکەی شاری (قوستەنتینیە) کۆچی دوایی کرد، ئەوکات لەنێو ڕیزی سوپاکەی (یەزیدی کوڕی معاویە) بوو، وەسێتی خۆی لە لای ئەو کردو، ئەویش نوێژی لەسەر کرد.[٦] لە ڕیوایەتێکدا هاتووە: (أبو أیوب) چوو بۆ غەزا، نەخۆش کەوت، جا وتی: کاتێك مردم، هەڵم بگرن، کە لەگەڵ دوژمن پێکهەڵشاخان فرێم بدەنە ژێر قاچی خۆتانەوە، بەڵام من فەرموودەیەکتان پێ دەڵێم کە لە پێغەمبەری خودا

---

١ سیر أعلام النبلاء (٢/٤٠٤).
٢ البدایة والنهایة (١١/٢٥٢).
٣ سیرة ابن هشام (٢/٣٠٢)، البدایة والنهایة (١١/٢٥٢).
٤ النور (١٢).
٥ سیر أعلام النبلاء (٢/٤٠٥).
٦ البدایة والنهایة (١١/٢٥٢).

(ﷺ)م بیستووەو دەیفەرموو: ((من مات لایشرك بالله شیئاً دخل الجنة))[١] واتە: هەر کەسێك لە حاڵێکدا مرد هیچ هاوەڵی بۆ خودا پەیدا نەدکردبوو دەچێتە بەهەشتەوە، ئەمەو (ئەبو ئەیوب) لە نزیك شورەی (قوستەنتینیە) نێژرا، ڕومەکان بەوانەیان وت کە ناشتبویان: ئەی عەرەبگەل! ئیمشەو مشەوەش بوون، چتان دەکرد؟ وتیان: یەکێك لە هاوەڵە گەورەکانی پێغەمبەرمان کۆچی دوایی کردبوو، سوێند بەخوا ئەگەر گۆڕەکەی هەڵدرێتەوە هەرگیزاو هەرگیز دەنگی ناقوس–ی کەنیسە– لە وڵاتی عەرەب نابیسرێت.[٢] ئیتر دوای هاتنی دەوڵەتی (عوسمانی)و فەتحکرانی (قوستەنتینیە) مەرقەدی (أبو أیوب)یش پێگەیەکی بەرزو مەزنی لە کلتوری (عوسمانی)یدا داگیر کرد، هەریەك لە سوڵتانەکانیانو بە نۆبەی خۆیان لە ڕۆژی چونە سەر تەختی حوکمیاندا ئاهەنگێکی ئاینیان لە مزگەوتی (أبو أیوب)دا دەگێڕا، وەکو سومبولێك بۆ وەرگرتنی ئەو دەسەڵاتەی پێیان دەدرا شمشێرەکانیان بە ملدا دەکرد، (أبو أیوب) (ڕەزای خوای لێ بێت) بە لای نەتەوەی تورك–پاشاو گەدایانەوە– پلەی (وەلی=دۆستی خودا)ی هەیەو دڵی ئیمانداران بە لای خۆیدا کەمەندکێش دەکات، بەو چەشنە تەماشای دەکەن، کە ئەو خانەخوێی پێغەمبەری خودا (ﷺ) بووەو، میوانداری کردووەو ڕێزی لێناوەو لە کاتی تەنگانەدا یارمەتی داوە، هەروەك چۆن پایەیەکی بەرزی لە نێو موجاهیداندا هەبووە، بە هەمان شێوەش پێیان وایە میوانداریکردنی لە پێغەمبەری خودا (ﷺ)و جیهادکردنەکەی لە ڕێی خودادا گەورەترین سیفەتو دیاترین شوێنەواری ناوازەی ئەون.[٣] (أبو أیوب) (ڕەزای خوای لێ بێت) لەو وەسێتەیدا کە بۆ هاوڕێکانی کرد–کە دەبێ لە نزیکترین هێڵی تەماسی دوژمن بینێژن جوانترین وێنەی بەجێهێشت کە بەڵگەیە لەسەر ئەوە چەندەی دڵ بە جیهادەوە بووە، ئەو ویستی بە زیندوویی‌و لە حاڵەتی نەخۆشیداو بە مردوویش کە لە نێو دارەبازدا بوو لەسەر شانی هاوەڵانی بووە، خۆبەنێو خاکی دوژمندا بکاتو جیهاد بکات، وەکو ئەوە ئەوەی بە زیندوویی کردوویەتی بەشی نەکردبێتو ئاواتەخواز بووبێت دوای مەرگیشی داوای زیاتری کردبێت، ئەمە بە واتا قوڵو ڕاستو دروستەکەی لە چەمکی موجاهیدی ڕاستەقینەدا سنورێکی لە دوای خۆی بەجێ نەهێشتووە.[٤]

---

١ سیر أعلام النبلاء (٢/٤١٢) إسناده قوي.

٢ المصدر نفسه (٢/٤١٢).

٣ الصحابي الجليل أبو أيوب الأنصاري، حسين المصري (ص: ١٢).

٤ المصدر نفسه (ص: ٦٨).

لە کاتێکدا هەموو خاك خاکی خودان، شتێکی سەیرو نامۆیە خەڵکانێك کە لە دەرەوەی وڵاتی خۆیاندا دەمرن، پێش مردنیان وەسێت دەکەنو داکۆکی لەسەر ئەوە دەکەن لە وڵاتی خۆیاندا بیاننێژن، شاعیرانی تورك لە شیعرەکانیاندا پێیان هەڵگوتووە، شێخی ئیسلام أسعد أفندی بەم شێوازە ئاماژە بە جێگەوپێگەی دەکاتو دەڵێت:

شهد الشاهد جاهداً ومجاهداً ومكابداً بحروبه ما كابداً
حتى أتى بصلابة ومهابة في آخر الغزوات هذا المشهدا
قد مات مبطوناً غريباً غازياً ففدا شهيداً قبل أن يستشهدا

لەو دەمەدا (أبو أيوب) بۆ غەزای (قوستەنتینیە) چوو تەواو پیر ببوو دەیوت: خودای بەرز فەرموویەتی: ﴿انفِرُواْ خِفَافًا وَثِقَالًا﴾[1] واتە: بڕۆن بۆ غەزا لە هەردووك حاڵەتی سوکیو قورساییتاندا. واتە: چ لە حاڵەتی گەنجیو بەهێزیو ساغو سەلیمیو هەبووییدا بن، چ لە حاڵی پیریو لاوازیو نەخۆشیو نەبووییدا بن، (دەیوت) لە هەر حاڵێکیاندا بم فەرمانەکە دەمگرێتەوە.[2]

(أبو أيوب) خەڵکی فێر دەکرد بە ڕاستو دروستی لە ئایەتەکانی قورئانو چەمکەکانی ئیسلام حاڵی ببن، (أبو عمران التجيبي) دەڵێت: بۆ غەزای (قوستەنتینیە) بەڕێکەوتین، (عبدالرحمنی کوڕی خالدی کوڕی وەلید) سەرکردەی تاقمەی غەزاکەر بوو، ڕۆمەکان پشتیان بە دیواری شورەی (قوستەنتینیە)وە دابوو، جەنگاوەرێك هەڵمەتی بردە سەر دوژمن، خەڵك وتیان نانا نەکەی (لا إله إلاّ الله)، دەیەوێت بە دەستی خۆی خۆی لەنێو بەرێت، (أبو أيوب) وتی ئەم ئایەتە لەسەر ئێمەی (گەلی ئەنصار) دابەزی، کاتێك خودای بەرزو مەزن پێغەمبەرەکەی (ﷺ) سەرخستو ئیسلامی بەدەرخست، وتمان: یاڵلا با ئەمجا سەرپەرشتی سامانو کارو کەسابەتو باخو باخاتو زەراعەتمان بکەینو ڕێکی بخەین، جا خودای بەرز ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ﴾[3] واتە: سامان لە ڕێی خودا ببەخشنو بە دەستی خۆتان خۆتان فڕێ مەدەنە -چاڵی- لەنێوچوونەوە، جا خۆلەنێوبردن بە دەستی خۆ بریتیە لەوە هەر خەریکی سەروەتو

١ التوبة (٤١).
٢ سكب العبرات للموت والقبر والسكرات (١/١٧٥).
٣ البقرة (١٩٥).

سامان‌و کارو کەسابەتمان بین‌و واز لە جیهاد بهێنن، ئەمەو (أبو أيوب) تا ئەو ڕۆژەی لە (قوستەنتینیە) نێژرا بەردەوام لە جیهاد بوو.[1] ئەم حەدیسە بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە خۆسەرقاڵ کردن بە ماڵ‌و سامان‌و گوێ نەدان بە جیهاد چەند خەتەرەو لەنێوچونی ڕاستەقینە بریتیە لەوە کە بە هۆی خۆگنخاندن لە ئەنجامدانی ئەرکەکانی ئیسلام دواڕۆژ لە دەست بچێت.[2]

## پێنجەم: دووەمین گەمارۆی سەر (قوستەنتینیە):

(معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) بە هۆی هەڵمەتە یەك لەسەر یەکەکانی‌و دەستبەسەرداگرتنی هەردووك دورگەی (ڕودس‌و ئەرواد) -کە لە پێشدا ئاماژەمان پێکرد- توانی تەنگ بە دەوڵەتی (بیزەنتی) هەڵبچنێت، دورگەی (ئەرواد) -کە سەرچاوە ئەوروپیەکان (کزیکوس)ی پێ دەڵێن- بە هۆی نزیکبوونی لە (قوستەنتینیە) بایەخێکی ئیسلامی لە میانەی گەمارۆدانی دووەمی پایتەخت‌و ماوەی جەنگی حەوت ساڵەی نێوان ٥٤ـ٦٠ك کردی بە بنکەی سەرەکی چالاکیە سەربازیەکانی خۆی، چونکە (معاویە) هێزێکی کەشتیرانی گەورەی سازکردبوو، بۆ جاری دووەم بۆ گەمارۆدانی (قوستەنتینیە)ی بەڕێ کردەوە، ئەمەو لە ٥٤ تا ٦٠ی کۆچی لە بەرانبەر شورەو قەڵاکانی سەنگەری گرت،[3] گەشتیگەل بە خاتری گەمارۆدانی شار لە باری وشکانیەوە سەربازانی لەم دوورگەیەوە بەرەو وشکانی دەگواستنەوەو، بەم چەشنە گەمارۆدان لە دەریاو وشکانیەوە ئاڵقەی بەست کە لە مانگی نیسان تا مانگی ئەیلول درێژەی کێشاو، نێوە نێوەش هەر لە بەیانیەوە تا ئێوارە تێکهەڵچوون لە نێوان هێزی کەشتیرانی ئیسلامی‌و، سەربازانی بیزەنتی ڕووی دەداو، هاوکات لەگەڵ ئەمەدا هێزی وشکانی ئیسلامی‌و سەربازانی قەڵانشینی بیزەنتی دەورەی (قوستەنتینیە) یەکتریان تیرباران دەکرد، ئەو بارودۆخە ماوەی حەوت ساڵ درێژەی کێشا،[4] کار بەوە گەیشت بیزەنتیەکانیان شپرزە کردن‌و زیانی گورچکبڕیان پێگەیاندن‌و تەنگیان پێ هەڵچنین‌و تووشی ترس‌و بیم‌و دڵەڕاوکێیان کردن، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا نەیانتوانی بەسەر

---

١ سنن أبي داود: (٢٥١٢)، سنن الترمذي (٢٩٧٢).

٢ التأريخ الاسلامي (١٥/١٣).

٣ تأريخ الطبري (٦/٢١٠ـ٢٤٠).

٤ العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ٣٥١، ٣٥٢).

پاسەوان‌و بەرگریکارانی شورەو قەڵاکانیدا زاڵ ببن‌و خۆ بەنێو شاردا بکەن،[١] ژمارەیەك هۆکار هاریکاربوون تا (قوستەنتینیە) بەم شێوەیە خۆڕاگر بێت:

١ـ بەکارهێنانی ئاگرێك لە لایەن بێزەنتیەکانەوە کە پێیان دەوت (ئاگری دەریایی) یان (ئاگری ئیغریقی)و بریتی بوو لە: ئاوێتەیەکی کیمیایی پێکهاتوو لە نەوت‌و کبریتی ڕەش بە ئاگر هەڵدەبوو، لە بەلەمەکانیانەوە ئاگریان پێوە دەناو دەیانگرتە سەربازانی ئیسلام، سەیرەکەی لەوەدا بوو کاتێك بەسەر ئاودا سەرچیغی دەکرد بڵێسەی زیاتر دەبوو، (کالینکوس) کە ئەندازیارێکی سوریایی بوو سەرەتای کار لە خزمەت موسڵماناندا بوو، هەڵات بۆ (قوستەنتینیە)و ئیتر پسپۆڕی خۆی خستە خزمەت بێزەنتیەکانەوەو ئەم چەکە کیمیاییە سوتێنەرەی بۆ داهێنان.[٢]

ئەم چەکە نوێیە هاریکاریەکی گەورەی بێزەنتیەکانی کردو، بوو بە گرنگترین هۆکاری خۆڕاگرییان‌و بەرگریکردنی درێژخایەنیان لە پایتەختەکەیان، ئیدی ئەم چەکە بە بەردەوامی ڕازێکی نادیار بوو، جگە لەو پسپۆڕانەی بەشداری دروستکردنیان دەکرد کەس نەیدەزانی چۆن دروست دەکرێت، سەرکردە سەربازیەکانی ڕۆم (ئەباتیرە) –بەبێ پەردە لادان لەسەر نهێنیەکەی– بە پێدانی ئەم چەکە هاوکاری هاوپەیمانەکانی خۆیان دەکرد، چوار سەدە بەسەر دروستکردنیدا تێپەڕی‌و جگە لە داهێنەرەکەی کەس نهێنیەکەی نەدەزانی، تا لە سەدەی ١٠ی زایینی‌و ٤ی کۆچی، لێکۆڵەرەوان پەردەیان لەسەر ڕازی ئەم ئاگرە لابردو، دەریان خست کە لە چوار توخم پێك دێت‌و، بە چ ئامرازو کەرەستەیەکیش دەکوژێتەوە، ئیتر پەرەی پێدراو جۆری وای لێ دروست دەکرا کە کتومت بە بۆمبەکانی ئەمڕۆ دەچوون‌و، بە هۆی (مەنجەنیق) یان لولەی لە مس دروسکراو لەسەر کەشتیەکانەوە بەرەو ڕووی دوژمن دەتەقێنران، پێشدا حەشوە یان تراقەکەی چەخماخەی ئاگری لێ دەدراو، ئەمجا دووکەڵە شینکەیەکی چڕی لێ هەڵدەستاو دەنگێکی گەورەی لێ دەهات، ئیتر ئەم داهێنراوە مێشکی زانا موسڵمانەکانی بە خۆوە خەریککرد، بە جۆرێك بەردەوام بیریان لێ دەکردەوەو توێژینەوەیان لەسەر دەکرد، تا ئەوەی لە سەرەتاکانی سەدەی ١١ز/٥ك بەسەر وردەکاری ڕازەکانیدا کەوتن‌و چەشنە گۆڕانکاریەکیان بەسەردا هێنا کە لە (ئاگری ئیغریقی) لە کڵپەو دەنگو سوتاندا بەهێزتر بێت، پاشان لە شام موسڵمانەکان ئەم چەکە لەنێوبەرەیان لە

---

١ الأمويون والبيزنطيون (ص: ١٧٦)، العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ٢٥٢).

٢ الأمويون والبيزنطيون (ص: ١٧٦)، العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ٢٥٢).

جەنگی دژ بە خاچپەرستەکاندا بەکارهێناو، وای دەپێکان‌و دەیسوتاندن کە ترس‌و تۆقانی لەنێودا بڵاوکردبوونەوە، ئیتر لەو دەمەوە ئەم ئاگرە بە (ئاگری) ئیسلامی[1] ناوی دەرکرد.

(د. إبراهیم العدوی) دەڵێت: -بۆیە ئەم ناوەی لێنرابوو- چونکە دوژمنان لە بەرانبەر ناسینی ئەم چەکە نوێیەدا کە بە دەست موسڵمانەکانەوە بوو دەستەپاچە بوون، ئەمەو تا سەدەی ١٤ز:٨ك (ئاگری ئیسلامی) بە شێوەیەکی بەربڵاوو بە بەردەوامی بەکاردەهێنرا، ئەمجا گۆڕانکاری بەسەردا هێنراو بە جۆرێك پەرەی پێدرا، کە لە دواییدا سەری کێشا بۆ دروستکردنی (باروت)، لێرەوە (ئاگری ئیسلامی) بە بناغەی ئەم کودەتا سامناکەی شێوازی جەنگ دادەنرێت کە جیهانی ئەمڕۆ ناسیویەتی، موسڵمانەکان سەلماندیان کە ئەوان لە بەرانبەر هەر جەنگێکی تازەدا کە دوژمنەکەیان نیشانیان دەدات‌و لە دژی ئەوان دایدەهێنێت دەستەوستان ڕاناوەستن، بەڵکو ئەوان لەمەولاو بە گوێرەی خواستی سوودو بەرژەوەندی خۆیان دەتوانن بەکاری بهێنن.[2] لەبەر خوای بەرزو مەزن دەپاڕێینەوە یارمەتی موسڵمانان بدات ڕێگاچارەیەك بۆ لابردنی ئەو ڕەمەندە سەربازیە بدۆزنەوە کەبە هۆیەوە لە لایەن ئەمریکاو خۆرئاواوە گەمارۆ دراون.

٢ــ دروستکرانی محاجەرەیەکی ئاسنینی گەورە لە نێوان قۆچی زێڕینی بەندەری (قوستەنتینیە)و کەنارەئاوی بەری ئاسیا، بە جۆرێك لە کاتەکانی جەنگو بارودۆخی ئینزاری گەمارۆداندا دادەخرا.[3]

٣ـ هەڵکەوتنی شار لەسەر شێوازێکی شازی جوگرافی، (بینز)ی مێژوونووس بەم جۆرە باسی لێوەدەکات: کە (قوستەنتینیە) کەوتۆتە سەر نیوەدوورگەیەکی بەرزی باری ئەورووپاو بە کەنارەئاوی بەری ئاسیا گەیشتۆتەوەو، کەوتۆتە سەر پارچە زەویەکی نێوەڕاستی ڕێگای نێوان سنووری باکوورو خۆرهەڵاتو هەڵکشان‌و داکشان‌و شەپۆلە توندەکانی دەریای (مەرمەرە) لە بەرانبەر هێرش‌و پەلامارە دەریاییەکانی سەری دەیپارێزێت.

٤ـ شوورەو قەڵا زەخمەکانی دەرەوەو ناوەوەی‌و دەوڵەمەندبوونیان بە بوونی ژمارەیەك بورجی چاودێری کە ڕۆڵی کەشفکردنی جموجۆڵە سەربازیەکانی دوژمنیان دەگێڕاو ڕەگەزی کتوپڕییان لە پەلامارە لە نکاوەکاندا پوچەڵ دەکردەوە.

---

١ الأمويون، محمد الوكيل (١/٦٥).

٢ الأمويون والبيزنطيون (ص: ١٧٨).

٣ من دولة (عمر) الى دولة (عبدالملك) (ص: ١٦٧).

٥ــ لاوازی ئـەزمونی دەوڵـەتی ئومـەوی لـە بـواری جـەنگی گـەمارۆدانی شـارێکی وەکـو (قوسـتەنتینیە) کـە لەسـەر ئـاو هەڵکـەوتووەو، دەستبەسـەرداگرتنی پێویـستی بـە چـەکی پێشکەوتوو شێوازی تازەی جەنگی هـەبوو، کـە تـا ئـەو کاتـە سـوپای ئومـەوی بـە دەسـتی نەهێنابوون.[1]

٦ـ پەیوەندی دیبلۆماسی بێزەنتی–ئیسلامی:

هۆکارگەلێك بوونە ڕێگر لەبەردەم ڕووخانی (قوستەنتینیە)دا، لەو هۆکارانـە: قـایمی شـار لـە ڕووی شـوێنی سروشـتیەوەو سـەختی قـەڵاو شـورەکانی‌و، (ئـاگری ئیغریقـی)و، ناسـازی کەشوهەواو، ئەو شەپۆلە توندوتیژە دەریاییانەی کە لە دەریای ڕەشەوە دەهـاتن‌و سـنگیان وەبەر سینگی سەربازانی ئیسلام دەداو نەیاندەهێشت دەسـت بەسـەر شـاردا بگـرن، ئەمـەو لەگەڵ هەموو ئەو خۆڕاگری‌و ئازایەتی‌و قارەمانیەتیەی نواندیان، بەڵام لە کۆتاییدا بارودۆخی نێوخۆ خوازیار بوو هەردووك دەوڵەت کۆتایی بە گەمارۆو جەنگ بهێنن‌و، ئیدی دەسـتیان بـە گفتوگۆ کردو پەیمانێکی ئاشتیان لە نێوان خۆیاندا بەست، بەپێی ڕێکەوتنەکە:

سـوپاو کەشـتیرانی ئیـسلامی بـەرەو (شـام) گەڕانـەوەو... ئەوەنـدەی پەیوەنـدی بـە دەوڵەتی ئومەویەوە هەبێت: کاتێك معاویە تەماشای کرد بـە سـاڵدا چـووەو ئەجـەلی مـەرگی نزیك بۆتەوەو، ماوەی حەوت ساڵی ڕەبەقیش بەسەر گەمارۆدانەکەدا تێپەڕیوەو ئامانجیـشی نەپێکاوەو حیسابیشی بۆ هـەموو ئـەو دژواریانـە دەکـرد کـە دوابـەدوای مـەرگی ڕووبـەڕووی (یەزید)ی کوڕی‌و خەلیفەی دوای خۆی دەبنەوە، بوونی ئەم سوپایەش لە وڵاتـدا بـۆ زەبـت‌و ڕەبتکردنی کاروبارەکانی نێوخۆ پێویستە، بۆیە بە چاکی زانی ئەم سوپا گـەورەی گـەمارۆی (قوستەنتینیە)ی داوە بۆ وڵات بگەڕێتەوە.

هەروەها دەوڵەتی (بێزەنتی)یـش حـەزی بـە لاچـوونی ئـەو گەمارۆیـە دەکـرد کـە لەسـەر پایتەختەکەی دانراوەو تەواو بێـزاری کـردووەو سـوپاکەی شـپرزە کـردووەو، لەبـەر ئەوەیـە دەوترێت: دەوڵەتی بێزەنتی بـەناوبانگترین‌و زیـرەکترین پیـاوی دیبلۆماسـی خـۆی بـە نـاوی (یۆحەننا) بۆ (دیمەشق) ڕەوانە کردو، ئامادەی چـەند کۆبوونەوەیـەك بـوو کـە کەسـە هـەرە باشەکانی بنەماڵەی ئومەوی تێدا بەشداربوون، لە بەرانبەر ئەو میواندارییە جوانـەی لـە لایـەن (معاویە)وە لێی کرا، ڕێزو حورمەتی زۆری خۆی بۆ دەوڵەتی ئیسلامی نیشانداو، گفتوگۆکانی سـەریان کێـشا بـۆ ڕێکـەوتنێکی ئاشـتیانەی نێـوان هـەردووك دەوڵـەت، دوای واژۆکردنـی

---

[1] الصدر نفسه (ص: ١٦٨).

پەیماننامەکە هێزە ئیسلامیە سەنگەرنشینەکانی باری وشکانی‌و دەریایی دەورەی (قوستەنتینیە) ڕێگای گەڕانەوەیان بەرەو (شام) گرتەبەر، پایتەختی بێزەنتیەکانیان لە نرکەو ناڵەی برینەکانیدا بەجێ هێشت.[1]

## شەشەم: پەیوەندی ئاشتیانەی نێوان هەردوو دەوڵەت:

هەرچەندە لە ئەنجامی بزوتنەوەی جیهادی ئیسلامی سەردەمی خیلافەتی ڕاشیدەو بەردەوامبوونی لە سەردەمی (ئومەوی)یدا کە خۆی لە هاوینەغەزاو زستانەغەزادا نیشان دەداو، بە درێژایی ساڵ بەردەوام بوون‌و، هەموو ئەو ڕۆڵە جیهادیەی شارە سەرسنوورییەکان‌و هێڵەکانی تەماس دەیانگێڕا، پەیوەندیەکانی نێوان دەوڵەتی ئیسلامی‌و دەوڵەتی بێزەنتی، لە سەردەمی (خیلافەتی ڕاشیدە)و سەردەمی (ئومەوی)یدا سروشتێکی سەربازییان هەبوو، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە سروشتی ئاشتیانەی نێوانیان کە خۆی لە گفتوگۆو هاموشۆی نێوانیاندا دەنوێنێت لە ئارادا نەبوبێت‌و فەرامۆش کرابێت، بێگومان پەیوەندی ئاشتیانەی نێوان دەوڵەتی ئیسلامی‌و دەوڵەتی بێزەنتی لە سەردەمی ئومەویدا خۆی لە چەند ڕەنگێکی جیاوازدا نیشان دەدا، وەکو: نامە گۆڕینەوەو هاموشۆی نوێنەران‌و، ئاڵوگۆڕکردنی شارەزاییەکان‌و، گۆڕینەوەی دیلەکان‌و، گفتوگۆو ڕووبەڕووبوونەوە لە بوارەکانی ڕۆشنبیریدا.[2]

١ـ نامەگۆڕینەوە: (معاویە) لە سەردەمی ئاشوبدا لەگەڵ قەیسەری ڕۆمدا دەستی بە نامەو نامەکاری کرد، لە ئەنجامدا پەیمانێکی ئاشتی لەگەڵ بەست، لەسەر ئەوە (معاویە) بڕێك پارەی پێ بداتو، هەر یەکەیان ژمارەیەك نەفەری یەکتر لە لای یەکتر بە بارمتە گل بدەنەوە،[3] (معاویە) بارمتەکانی ئەوانی لە (بەعلەبەك) دانان، دەوڵەتی (ڕۆم) ناپاکی نواندو پەیمانەکەی شکاند، بەڵام (معاویە)و موسڵمانەکان بارمتەکانیان نەکوشتن، بەڵکو ئازادیان کردن‌و وتیان: وەفادارییەك لە بەرانبەر پەیمانشکێنیەکدا باشترە لە غەدرێك کە بەرانبەر غەدرێك بکرێت،[4] گرنگ ئەمەیە کە وێنەی ئەم ڕووداوانە پێویستە بە پێوەری تایبەتی خۆیان بپێورێن‌و، لە بنەڕەتدا دروست نیە دەوڵەتی ئیسلامی لە ئاقار دەست گرتن بە هۆکارەکانی

---

١ الأمويون والبيزنطيون (ص: ١٧٥)، العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ٢٥٣).

٢ العلاقات العربية والبيزنطية في العصر الأموي (ص: ١٢٢ـ١٢٣).

٣ المصدر نفسه (ص: ١٢٣).

٤ فتوح البلدان (ص: ١٦٣) للبلاذري، العلاقات الخارجية للدولة الاسلامية ((ص: ٢٣٩).

هێزسستیو تەنبەڵی بنوێنێت، مەگەر لە دۆخێکی لاوازدا بێتو بزانێت دوژمنان دەرەقەتی دێن، یان تەماعکاران بە چاوی تەماعەوە بۆی دەڕوانن، لە بنەڕەتدا پێویستە دەوڵەتی ئیسلام هێند بەهێزو دەسەڵات بێ دوژمنان بە چاوی ترسو سامو هەیبەتەوە تەماشای بکەن، کاتێکیش بە قۆناغی لاوازیدا تێپەڕی، یان پێویستی بەوە بوو لە بەرانبەر مانەوەیدا ماڵ ببەخشێتو باری زیان هەڵبگرێت، ئەوا ئەمە دەچێتە بابەتی (ناچاری= الضرورات)ەوەو بۆی نابێت بە بڕیارێکی گشتی، وەکو شەرعزانان وتوویانە: (ناچار بە ئەندازەی ڕزگاربوون بۆی حەڵاڵ کراوە)[1] و بەستنی پەیمانی ئاشتی بەردەوام لەگەڵ دوژمندا بەو جۆرەی پارەو سامانی پێ بدرێت دروست نیە، بەڵکو ئەمە تەنها بۆ قۆناغی لاواز بوونو دۆخی ناچاربوون ڕەوایەو، هاوکات لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ کاری جیددی و شێلگیرانە بۆ تێپەڕاندنی ئەم قۆناغو دۆخەو دامەزراندنەوەی سەر لە نوێی هێزو دەسەڵاتو تواناکانی ئوممەت ئەنجام بدرێت، جا کاتێك قۆناغەکە تێپەڕێنراو دۆخەکە کۆتایی هات، ئەو کاتە لەسەر موسڵمانان پێویست دەبێت نەهێڵن صوڵحێك بکرێت کە داماوی ئەوانی تێدایەو بە زیان دەشکێتەوە بەسەریاندا، بە پوختی: دەوڵەتی ئیسلامی بۆی دروستە پەیمانی ئاشتی بە گوێرەی ناچارییەك کە تێیدا کەوتووە ببەستێ، بە کۆتایی هاتنی بارودۆخی ئەو ناچارییەش کە پەیمانەکەی لە پێناودا بەستراوە کۆتایی پێ دەهێنرێت.[2]

نامە گۆڕینەوە بەس لە بواری سەربازیدا کورت هەڵنەهاتبوو، بەڵکو گێڕدراوەتەوە کە هەندێك نامەو نامەکاری لایەنی پرسیارو وەڵامی زانستیانەو کاروباری گشتی لە خۆداگرتووە، قەیسەری ڕۆم بەم جۆرە نامەیەکی ئاراستەی (معاویە) کرد: بۆ (معاویە) سەلامت لێ بێت: ئەمجا: هەواڵم پێ بدە سەبارەت بە: خۆشەویستترین وشە بە لای خوداوە، ئەمجا (دووەم، سێهەم، چوارەم، پێنجەم) هەروەها سەبارەت بە چوار شت کە گیانلەبەر بوون بەڵام قۆناغی نێومنداڵدانیان نەدیوە، هەروەها سەبارەت بە: گۆڕێك کە خاوەنەکەی دەگێڕاو، جێگایەکیش لە زەویدا جگە لە جارێك تیشکی خۆری بەرنەکەوتووەو، چەند پرسارێکی تریش، (معاویە) لە نامەیەکدا بەم جۆرە وەڵامی دایەوە: خۆشەویستترین وشە بە لای خوداوە (لا إله إلاّ الله)یە، بە هۆی ئەمەوە نەبێت هیچ کارو کردەوەیەك وەرناگیرێت، بەڵکو خاوەنەکەی ڕزگار دەکات، دووەم: (سبحان الله)یە، کە نوێژی هەموو بوونەوەرەکانە، سێهەم: (الحمد لله)یە کە

---

١ الاشباه والنظائر إبن نجيم (ص: ٨٦).

٢ العلاقات الخارجية للدولة الاسلامية ((ص: ٢٤٠).

وشەی شوکرانەبژێریە، چوارەم: (الله أكبر)ە کە بریتیە لە کلیلەی نوێژو ڕکوعو کڕنوش، پێنجەم: (لاحول ولا قوة إلاّ بالله)یە، ئەو چوار شتەش کە گیانیان بەبەردا کرابوو نێوڕەحمیان نەدیتووە: بریتین لە: (ئادەم، حەواء، گۆچانەکەی موسا، بەران-ەکەی اسماعیل-)، ئەو شوێنەش کە تەنها یەکجار خۆری بەرکەوتبوو بریتیە لە: دەریا-ی نیل- کە بۆ (موسا)و بەنی ئیسرائیل لێك جیابۆوە، ئەو گۆڕەش کە خاوەنەکەی دەگێڕا بریتیە لەو حوتەی کە (یونس)ی تێدا بوو.[1]

٢ـ گۆڕینەوەی زانیاری: هەریەك لە عەرەبو ڕۆم لە ئاست خۆیەوە هەوڵی دەدا لە تەواوی بوارەکانی ژیانیدا لە ڕێی وەرگرتن یان داهێنانەوە سود لە بەرانبەرەکەی وەربگرێت، ئەوەی موسڵمانەکان لە ڕۆمیان وەرگرت تەنها بریتی نەبوو لە وەرگرتن، بەڵکو گۆڕانکاری بەسەردا دەهێنرا، بە جۆرێك جار هەبوو پێیەوە زیاد دەکراو جاریش هەبوو لێی دەقرتێنرا تا وای لێ دەهات کە لەگەڵ ڕوحی ئاینی ئیسلام دەهاتەوە، ئەمە بە زۆری لە بواری هەڵمەتی ئاوەدانکردنەوەو بیناسازیدا خۆی دەنواندو، ئومەویەکان بایەخی زۆریان بە مزگەوتو چۆنیەتی بیناکردنیو فراوانکردنیو پێشکەوتنی دەدا.[2] (معاویە) ژمارەیەك ڕۆمی وەکو کاتیبی بواری ئیداری لە حوکومەتەکەی خۆیدا دامەزراندبوون کە پێشداو پێش فەتحکرانی شام لە حوکومەتی بێزەنتیداو هەر لەو وڵاتەدا ئەم کارەیان ئەنجام دابوو، ئەو کاتیبێکی ڕۆمی بە ناوی (سەرجونی کوڕی مەنسوری ڕۆمی)و پزیشکێکی ڕۆمی بە ناوی (ئەثالی نەسرانی) دامەزراندبوونو تایبەتیشی کردبوون بە خودی خۆیەوە.[3]

(معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) دەرهەق بە نەسرانیەکان لێبوردەو سینەفراوان بوو، (بروکلمان) گەواهی ئەمەی بۆ دەداتو دەڵێ: بە تەواوەتی لەگەڵ مەسیحیەکاندا ئاوێتە ببوون: (سرجونی کوڕی مەنسوری نەسرانی) لە کۆشکی حوکومەتەکەی (معاویە)دا ڕۆڵی ڕاوێژکاری دارایی جێبەجێکاری دەگێڕا، نەسرانیەکانیش بەرانبەر بەم سینەفراوانیو نەرمونیانەی (معاویە) وەفادار بوونو دڵسۆزیان بۆ دەنواندو، بە گەورەو مەزنیان دادەنا،

---

١ عيون الأخبار (١/٩٨، ٩٩)، الحدود العربية والبيزنطية (٢/٣٨٧)، العلاقات العربية والبيزنطية في العصر الأموي (ص: ١٢٦).

٢ تأريخ الاسلامي، آفاق السياسية وأبعاده الخضارية (ص: ١٣٢).

٣ العلاقات العربية والبيزنطية في العصر الأموي (ص: ١٣٢).

بەردەوام گێڕانەوە نەسڕانیەکانو هەتا کتێبە مێژووییەکانی ئیسپانیش ڕەنگی ئەم ڕاستیە نیشان دەدەن.[١]

٣ـ کاریگەری سینەفراوانیو نەرمونیانی ئیسلامی لەسەر دەوڵەتی بێزەنتی:

(العدوي) دەڵێت: نواندنی سینەفراوانیو نەرمونیانی ئیسلامی لە بەرانبەر (نەسڕانیەکان)دا کاری لەسەر دەوڵەتی بێزەنتی کرد، وەکو زانراوە ئەو خاوەن مەزەبە ژێردەستەکانی خۆی دەچەوساندنەوەو بە توندو تیژی هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەنواندنو حیسابی هەڵگەڕانەوە (هەڕاتیق)ی بۆ دەکردن، لەگەڵ دەرکەوتنی دەوڵەتی ئیسلامی بوونی زۆرێك لە مەسیحیەکان بە هاوڵاتی نێو جیهانی ئەو دەوڵەتە، ئیتر ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی سیاسەتو هەڵسوکەوتی خۆی گۆڕیو خۆی وا خستەڕوو کە ئەو لە پێشترە تا چاودێری مەسیحیەکانی نێو وڵاتی (شام) بکات.[٢]

(معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) لەگەڵ تاقمە مەسیحیەکان بە هەموو مەزەبە جیاوازەکانیانەوە دادەنیشتو گوێی لە گفتوگۆو مشتومڕە ئاینیەکان ڕادەگرت،[٣] بەم شێوازە دەوڵەتی ئومەوی ئیسلامی وێنەیەکی گەشو بەرزی وای نیشاندا، کە بەڵگە بێ بۆ مەزنایەتی پەیامی ئیسلامو ئاستی ئەو لێبوردەییو سینەفراوانیەی کە لە بەرانبەر ڕەعیەتە ناموسڵمانەکانیدا دەینوێنێت، زۆریش دوورە لەو توندو تیژیو دەمارگیریە ئاینیەی کە هەندێك لە ڕۆژهەڵاتناسەکان بە بوختان دەیخەنە پاڵی.[٤]

٤ـ دابو ڕەوشتی نوێنەرەکان: سیستەمی نوێنەران بەس لەسەر سەردەمی (ئومەوی) کورت هەڵنەهاتبوو، بەڵکو درێژبۆوەی سەردەمی پێغەمبەری خودا (ﷺ)و خەلیفە ڕاشیدەکان بوو، نوێنەر بە گوێرەی چەند تایبەتمەندیەکی خۆیو هەبوونی سیفەتگەلێك تێیدا هەڵدەبژێردرا، دەبوایە ئەو بە کەسایەتی بەهێزو هۆشیاریو بیرتیژی ناسرابایە، نوێنەری هەر یەك لەو دوو دەوڵەتە هەڵگری پەیامێك بوو کە دەبووایە بە وتار ئەدای کردبایەو، بە هۆیەوە کەسایەتی ئەوی پێ دەناسرا، مەبەستی سەرەکیش لە پەیامەکەی ئەمە بوو کە ئەو مافی ئەوەی پێدراوە بە شێوەیەکی ڕەسمی قسە بە ناوی دەوڵەتەکەیەوە

---

١ تأريخ الشعوب الاسلامية، نقلا عن العلاقات العربية والبيزنطية (ص: ١٤٠).

٢ العلاقات العربية والبيزنطية في العصر الأموي (ص: ١٤٢).

٣ المصدر نفسه (ص: ١٤٢)، نقلا عن الأمويين والبيزنطيين.

٤ المصدر نفسه (ص: ١٤٢).

بکات،[١] مەسەلەی نوێنەران بە تەنها جێگەی گرنگی پێدانی دەوڵەتی ئیسلامی ئومەوی نەبوو، بەڵکو ڕۆمەکانیش بایەخیان بە نوێنەرەکانی خۆیان دەدا، لەنێو ڕیزی ئەو پیاوە دینیانەیاندا هەڵدەبژاردن کە دەبووایە زۆر زیرەك‌و زرنگ بوونایەو شارەزای کاروباری ئاینەکەیان بوونایەو توانای گفتوگۆو دانوستانیان تێدا هەبووایەو، ڕەوانبێژو زمانپاراو بوونایەو، وێڕای شارەزایی تەواو لە زمانەکەی خۆیان زمانی عەرەبیشیان بە چاکی زانیبایە.[٢]

خەلیفەو سوڵتانەکان بایەخیان بە نوێنەرو نێردراوەکان دەداو، لە کۆشکەکانی خیلافەتدا پێشوازیان لێ دەکردن‌و گوێیان لە ڕاوبۆچوونەکانیان دەگرت، کاتێك (معاویە) لە دروستکردنی کۆشکەکەی بۆوە –کە بە کۆشکی (خەزرا)– ناوی دەرکرد–و سەبارەت بەمە پرسیاری لە نێردراوی بێزەنتیەکان کرد، ئەویش بەم جۆرە تێبینیەکانی خستنەڕوو، وتی: بەڵام قاتی سەرەوەی بۆ چۆلەکان دەبێت‌و، قاتی خوارەوەشی دەبێتە ماڵی مشکان، کاتێك (معاویە) ڕاست‌و دروستی ڕەخنەی بابای نێدراوی بۆ دەرکەوت، ئەمجا کۆشکەکەی تێکدایەوەو سەر لە نوێ بە بەرد دروستی کردەوە.[٣] بێزەنتیەکان لە کەنیسەی (ئەیاسۆفیا)و سەر پردەکانی ئاو، دێرەکانی دەوەروبەری (قوستەنتینیە) پێشوازیان لە نێردراوانی عەرەب دەکرد،[٤] کاتێك نێردراو دەیەویست بگەڕێتەوە وەکو نیشاندانی ڕێزێك بۆ خۆی‌و ئەو کەسەش ناردوویەتی چەند دیاری‌و گەوهەری گرانبەهای پێشکەش دەکران،[٥] وەکو دەردەکەوێت ئامانجی هەریەك لەم دوو دەوڵەتە بریتی بووە لە: دەرخستنی ڕێزونیازی چاك‌و پاکی خۆی بۆ بەرانبەرەکەی کە بە تەمای ئاشتی کردنە، هەروەها بۆ ئەوە بابای نێردراو بە چاوی خۆی هێزو دەسەڵاتی حوکمەت‌و ئاوەدانی‌و خۆشگوزەرانی ئەو وڵاتە ببینێت‌و کاتێك گەڕایەوە سەرسامیەکانی خۆی بۆ ئەو کەسە بگێڕێتەوە کە ناردوویەتی.[٦]

لەگەڵ ئەمەدا کە دەبوو نوێنەر یان نێردراو دارای ئەو سیفەتانە بووایە کە ئاماژەیان بۆ کرا، ئەوا بە خاتری ئەوە کەسێکی سیخوڕو دوزمان‌و تەڵەکەبازی لێ دەرنەچێت‌و ئاگری جەنگ هەڵنەگیرسێنێت لە ژێر چاودێری بەردەوامی خەلیفە یان مەلیکدا دەمایەوە، شتێکی

١ العلاقات العربية والبيزنطية في العصر الأموي (ص: ١٤٧).

٢ الأمويون والبيزنطيون (ص: ٢١٢_٢١٥).

٣ المصدر نفسه (ص: ٢٢٠).

٤ المصدر نفسه (ص: ٢٢٠).

٥ العلاقات العربية البيزنطية (ص: ١٤٨).

٦ المصدر نفسه (ص: ١٤٨).

لە ئەم بابەتە بەسەر یەكێك لە نێردراوەكانی معاویە هات، كە بە مەبەستی ئەنجامدانی (صولْح) بەرەو (قوستەنتینیە) بەڕێكرابوو، وا ڕاسپاردرابوو كە بە هیچ جۆرێك لەو مەرجانە كەم نەكاتەوە كە بەرنامەیان بۆ دانرابوو، بەلاّم ئەم نێردراوە لە میانەی ئەنجامدانی صولْحەكەدا نەیتوانی وەسێتەكەی معاویە جێبەجێ بكات، بەڵكو هێند بە سوكو سەلیمی لەگەڵیان پێكهات تا ئەوەی بە بەرژەوەندی بێزەنتیەكان تەواو بوو،[1] جا كاتێك گەڕایەوە لە پۆستەكەی دابەزاند.[2]

حەوتەم: (جوڕاجیمە) لە سەردەمی (معاویە)دا (ڕەزای خوای لێ بێت):

لە سەردەمی (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت)داو لە میانەی جەنگو پەلامارەكانی نێوان موسڵمانانو بێزەنتیەكاندا، لایەنێكی تر هەبوو بەشداری كێشەكەی دەكرد، ئەمانە بە خۆیان دەوت (جوڕاجیمە)و بەم ناوەیان خۆیان دەدایە پاڵ شاری (جوڕەجومە)[3] و بنەچەكەیان نادیارە، (البلاذري) دەڵێ: ئەمانە لەسەر ئایینی (نەسرانی)ینو شوێن (بطریق)ی ئەنتاكیەو سەرۆكەكەی دەكەون.[4]

كاتێك موسڵمانەكان (شام)یان فەتح كرد، (أبو عبیدة= عامری كوڕی جەڕڕاح) سوپایەكی بە سەركردایەتی (حەبیبی كوڕیموسلیمەی فەهری) بەرەو (جوڕەجومە) بەڕێكرد، بەلاّم دانیشتوانەكەی دەستیان نەكردەوە، بەڵكو داوای صولْحو ئەمانیان كرد، موسڵمانەكانیش صولْحیان لەگەڵ ئەنجام دان بەو جۆرە كە: پشتیوانی لە موسڵمانان بكەنو چیای (لوكام) بكەن بە ڕوانگەو چاودێری جموجۆڵەكانی دوژمن بكەنو، ئەگەر وا بكەن ئەوا سەرانە نادەن بە دەوڵەتی ئیسلامو لە هەر جەنگێكدا بەشداری موسڵمانانیان كرد ئەوا دەستكەوتەكانی خۆیان بۆ خۆیان دەبن.[5] بەلاّم هێندەی نەخایاند كە (جوڕاجیمە) ڕێككەوتنەكەیان پێشێل كردو دیوارێكیان لە نێوان موسڵمانەكانو بێزەنتیەكاندا دروست كردو، توانیان كۆسپ بخەنە بەردەم كاروانی فتوحاتی ئیسلامی بەرەو (ئاسیای بچوك)، پێت پێتی بوونو جار هەبوو لەگەڵ موسڵمانەكان بوونو، جاریش هەبوو لەگەڵ بێزەنتیەكان بوون، ئیتر ئەمانە نەك هەر

---

١ المصدر نفسه (ص: ١٤٩).

٢ المصدر نفسه (ص: ١٤٩).

٣ (جوڕەجومە): شارێكە لەسەر چیای (لوكام)ی سەر سنووری شامو كەوتۆتە نێوان (بیاس)و (بوقا)ی نزیك (ئەنتاكیە)، معجم البلدان (١٢٣/٢).

٤ فتوح البلدان (ص: ٥٨).

٥ المصدر نفسه (ص: ٥٨).

لە سەردەمی (معاویە)دا بەڵکو تا سەردەمی (عبدالملك) خەنجەرێك بوونو لە پشتی سوپای ئیسلام هەڵدەچەقین، ئەمجا هێندەی نەخایاند لە وڵاتی شامو ئاسیای بچووکدا پەرتەوازە بوونو، لە مەترسیەکەیان کەم بۆوە.[1] بە هەر حاڵ پێویستە ئەو ڕاستیە بڵێین کە: هەوڵو تەقالاو بەرنامەڕێژیەکانی (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) بۆ گەیشتن بە (قوستەنتینیە) – هەرچەندە لە ماوەی ژیانی خۆیدا بەرهەمیان نەبوو– بەڵام ڕۆڵێکی زۆر گرنگی گێڕا لە هەڵنانی خەلیفەکانی دوای خۆی تا کاروانەکەی ئەو بگەیەننە جێی مەبەست.[2]

هەشتەم: (أبو مسلم الخولانی): یەکێك بوو لە ڕیزی غەزاکەرانی نێوخاکی ڕۆم، نموونەی ئەو پیاوە مەزنانە بوو کە لەو سەردەمەدا وێنەیەکی پرشنگداری ئیسلامیانەیان پێشاندا لە چۆنیەتی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ حوکمڕانانو بەشداری ئیجابیانە لەنێو کۆمەڵگاداو چوونە نێوڕیزەکانی بزوتنەوەی فتوحاتەوە.

(الذهبي) سەبارەت بە (أبو مسلم) دەڵێت: براگەورەی تابیعیەکانو دنیانەویستی سەردەمی خۆی بوو، –بە گوێرەی ڕیوایەتی هەرە ڕاستو دروست– ناوی (عبداللهی کوڕی ثوب) بوو،[3] کاتێك گەیشتە (مەدینە) پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی دوایی کردبوو، (أبوبکر) ببووە (خەلیفە).[4] ژمارەیەك هەڵوێستی ڕەندی هەن کە لە دژی (أسودی عەنسی)–ی پێغەمبەرە درۆزنەکەی (یەمەن) ناونی، (أبو مسلم) بە ئیسلامەکەیەوە پابەند بوو، ڕۆژێك (ئەسوەد) بە دوایدا دەنێرێت، ئاگرێکی گەورە دەکاتەوەو هەڵی دەداتە نێویەوە، بەڵام ئاگرەکە زیانی پێ ناگەیەنێتو نایسوتێنێت، بە (ئەسوەد) وترا: ئەگەر ئەمە لێرە دوور نەخەیتەوەو نەفی نەکەی شوێنکەوتووەکانت لێ هەڵدەگێڕێتەوە، ئەویش فەرمانی دا بار بکات، جا بەرەو (مەدینە) بەڕێ کەوت، کاتێك گەیشت، حوشترەکەی یەخ داو چووە نێو مزگەوتەوەو دەستی بە نوێژ کرد، (عمر) (ڕەزای خوای لێ بێت) چاوی پێکەوتو هات لە پشت سەریەوە وەستاو وتی: لە کوێوە هاتووی؟ وتی: لە (یەمەن)ەوە، وتی: ئەو کەسەی درۆزنەکە بە ئاگر سوتاندیو –نەسوتا– چی کردو کێیە؟ وتی: ئەو کەسە (عبداللهی کوڕی ثوب)ە، وتی: توخوا تۆ ئەو کەسە نی؟ وتی: (اللهم) بەڵێ، جا (عمر) دەستەملانێی لەگەڵ کردو گریا،

---

١ خلافة معاوية للعقيلي (ص: ١١٦).

٢ المصدر نفسه (ص: ١١٦).

٣ سير أعلام النبلاء (٤/٧، ٨).

٤ المصدر نفسه (٤/٨).

ئەمجا هەڵی ستاندو بردی تا گەیاندیە لای (أبو بكری صدیق)و لە نێوان خۆیو ئەودا داینیشاندو وتی: سوپاس بۆ ئەو خودایە کە نەیمراندم تا کەسێکی لە ئوممەتی (محمد) نیشاندام (ئیبراهیمی خەلیل) چی بەسەر هێنرابوو بەسەر ئەویش هێنرا،[١] ئەم تابیعیە مەزنە لە سەردەمی (معاویە)دا لە (شام) بوو، خەڵکێکی زۆر بە هۆی ئەوەوە کاریان تێ کرابوو، ئەو (بەر ڕەحمەتی خوا بکەوێت) پەرستشی زۆر بوو، (أبو العاتكة) دەڵێ: (ئەبو موسلیم) شوڕکەدارێکی لە مزگەوت هەڵواسیبوو،[٢] دەیوت: من لە ئاژەڵەکان لە پێشترم بۆ قەمچی، جا کە بە لادا دەکەوت بە توندی یەك دوو قەمچی لە قاچی دەدان، دەڵێن: کە وتوویەتی: ئەگەر بەهەشتو دۆزەخ بە چاو ببینم هیچی تر ئیمانەکەم زیاد نابێت،[٣] (شورەحبیل) دەڵێ: دوو پیاو بۆ لای (أبو مسلم) هاتن، چوونە ماڵ دەستیان نەکەوت، هاتنە مزگەوت تەماشایان کرد لە ڕکوعدایە، یەکێکیان ژماردی کە سێسەد ڕکاتی کردووە.[٤] هەر کاتێك (أبو مسلم) داوای بارانی کردبایە نزاکەی گیرا دەبوو دەباری،[٥] (محمدی کوڕی زیاد) لە دەمی (أبو مسلم)ەوە دەگێڕێتەوە کە: ژنێك هاوسەرەکەی لێ هەڵدەگێڕێتەوە، ئەویش: توکی لێ دەکاتو، یەکسەر چاوی کوێر دەبێت، هاتە لایو سکاڵای خۆی عەرز کردو تۆبەی کرد، (أبو مسلم) وتی: ئەی خودایە ئەگەر –لە تۆبەکردنەکەیدا– ڕاستگۆیە، چاوەکانی بۆ بگێڕەوە، جا بینایی بۆ گەڕایەوە.[٦] ئەو بەر ڕەحمەتی خودا بکەوێ لە خاکی ڕۆمدا بەشداری جیهادی کردووە، (أبو مسلم) دەگێڕێتەوە: کاتێك بۆ غەزا دەچوونە نێو خاکی ڕۆمەوەو، بە ڕووبارێکدا تێدەپەڕین، دەیوت: بە ناوی خودا تێدەپەڕین، بۆ خۆی لە پێشیانەوە دەڕۆیشتو ئەوانیش بەدوای ئەودا بەو چۆمە بە خوڕەدا دەپەڕینەوە، بە ئەمری خودا ئاوەکە تەنها دەگەیشتە ئەژنۆی وڵاخەکان، جا کاتێك تێدەپەڕین دەیوت: ئایا ڕووبارەکە هیچی لە کەس بردووە؟ کێ شتێکی لێ کەوتۆتە نێو چۆمەکەوە بە زەمانەت بۆی دێنمەوە، جار هەبوو یەکێکیان بە دەستی ئەنقەست توربێنەکەی خۆی هەڵدەدایە نێو ڕووبارەکەوە، جا کە دەگەیشتنە ئەوبەری ڕووبار

---

١ المصدر نفسه (٤/٩).

٢ المصدر نفسه (٤/٩).

٣ المصدر نفسه (٤/٩).

٤ المصدر نفسه (٤/١٠).

٥ المصدر نفسه (٤/١٠).

٦ المصدر نفسه (٤/١١).

کابرا دەیوت: توربێنەکەم کەوتە نێو چۆمەکەوە، دەیوت: شوێنم بکەوە، کەمێك دەڕۆیشتن‌و دەیانبینی چۆمەکە توربێنەکەی هەڵداوەتە قەراغ‌و پێی دەوت هەڵی گرەوە.[1] والیەکان بە هۆی (أبو مسلم)ەوە ئاواتیان بۆ پیت‌و بەرەکەت‌و سەرکەوتن دەخواست، بۆیە دەیانکردە فەرماندەی ڕیزەکانی پێشەوەی سوپا،[2] لە زستانە غەزایەکداو لەگەڵ (بوسری کوڕی ئەرتەئە) خۆی بەنێو خاکی ڕۆمدا کردو ئەجەلی هات‌و کۆچی دوایی کرد، (بوسر) بە نەخۆشی گێڕایەوە، (ئەبو موسلیم) پێی وت: ئەی بوسر: لە ڕیزی ئەو کەسانەمدا حیساب بکە کە لەم غەزایانەدا کۆچی دواییان کردووە، ئومێدەوارم لە ڕۆژی دوایی لە پێشەوەیان بم.[3] کاتێك (معاویە) هەواڵی مەرگی ئەوی بیست وتی: تەنها موسیبەت‌و هەموو موسیبەتێك-ی من- بریتیە لە مەرگی ئەبو موسلیمی خەولانی‌و کەریبی کوڕی سەیفی ئەنساری.[4] ئەبو موسلیم لە ڕیزی دانایان بوو، لەو بوارەدا کە تەواو بە قەدەزاو قەدەری خودا ڕازیە لێی گێڕدراوەتەوە: ئەگەر بێت‌و منداڵێکم ببێت‌و خودای مەزن‌و بە توانا نەمامئاسا گەورەی بکات‌و بیکات بە گەنجێکی جوانی وا سەرنجمی پێ ڕابکێشێت‌و ئەمجا لێمی بسێنێتەوە، ئا ئەمەم بە لاوە خۆشەویستترە لەوەی کە دونیاو ئەوەی تیایەتی هی من بێت.[5] ئەمە بەڵگەیە کە (أبو مسلمی کوڕی ثوبی خەولانی) یەکخواناسێکی تەمامعەیار بووە، بە چەشنێك قۆناغی ئارامگرتنی لەسەر قەدەرە ئازارگەیەنەکان تێپەڕاندووەو گەیشتۆتە قۆناغی ڕازی بوون بە قەزای خوداو وای دانا کە لەدەستدانی جگەرگۆشەیەکی گەنجی جوان‌و چاك -کە هەموو ئیماندارێك ئاواتی بۆ بخوازێت- بە لای ئەوەوە خۆشەویستترە لە دونیاو هەموو ئەو شتانەی تێیدایە.[6]

ئەمانەی ڕابوردن چەند ڕوویەکی پانی بەرەی شامی بوون کە پەیوەست بوون بە جیهادی (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت).

---

١ المصدر نفسه (١١/٤).

٢ المصدر نفسه (١٢/٤).

٣ المصدر نفسه (١٣/٤).

٤ المصدر نفسه (١٤/٤).

٥ صفة الصفوة (٢١٣/٤)، حلية الأولياء (١٢٧/٢).

٦ التأريخ الاسلامي (٣٥٨/١٩).

## باسی دووەم

## فتوحاتی باکوری ئەفریقیا لە سەردەمی ( معاویە )دا ( ڕەزای خوای لیٚ بیٚت )

### یەکەم: هیٚرشی ( معاویەی کوڕی حەدیج ) ( ڕەزای خوای لیٚ بیٚت )

(معاویەی کوڕی حەدیجی کیندی) هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ) بووەو چەند فەرموودەیەکی کەمیشی لیٚ ڕیوایەت کردوون، دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: ((إن كان في شيءٍ شفاء فشربة عسل، أو شرطة محجم أو كية نار، وما أحب أن أكتوي))[١] واتە: ئەگەر شتێك شیفای دەردی تێدابێت ئەوا بە مسۆگەری لەم سیٚ شتەدا دەست دەکەوێت: شەربەتێچکی هەنگوین یان کەڵەشاخ گرتنێك یان داخ کردن بە ئاگر، بەڵام حەز بە داخکردن ناکەم. (معاویەی کوڕی حەدیج) (ڕەزای خوای لیٚ بێت) شاو پیاوماقوڵێکی قسە ڕۆیشتووی (کیندە) بوو،[٢] لە میرە هەرە باشەکان دەژمێردرا، (عبدالرحمنی کوڕی شماسة) دەڵیٚ: چوومە لای (عائیشە)، وتی: خەڵکی کوێی؟ وتم: خەڵکی (مصر)م، وتی: (ئیبنو حەدیج)تان لە غەزاکانی ئەوێدا چۆن بینی؟ وتم: باشترین فەرماندە بوو، هەر پیاوێکمان ئەسپەکەی یان وشترەکەی یان خزمەتکارەکەی وەستابایە بۆی دەگۆڕینو یەکێکی باشتری پیٚ دەداین، وتی: کوژرانی براکەم[٣] لە لایەن ئەوەوە ڕێم پیٚ ناگرێت ئەم فەرموودەیەتان بۆ بگێڕمەوە کەلە پێغەمبەری خودا (ﷺ)ەوە بیستووە: ((أللهم من ولي من أمر أمتي شيئاً فرفق بهم، فأرفق به، ومن شق عليهم فأشقق عليه))[٤] واتە: خودایە: هەر کەسێك کەمێك لە کاروباری ئوممەتمی کەوتە بەر دەستو بەبەزەیی لەگەڵیان جوڵایەوە، تۆش بەزەیی بەرانبەر بنوێنە، هەر کەسێکیش بە سەختی لەگەڵیان جوڵایەوە، تۆش لە بەرانبەریدا سەختگیر بە، دوای ئەوە پۆستی دەسەڵات بۆ (معاویەی کوڕی أبی سفیان) ساغ بۆوە، لە پێش هەموو بەرەکاندا بایەخی بە بەرەی باکوری (ئەفریقیا)دا، چونکە لەلایەکەوە هاوسنوری خۆرئاوای (مصر) بوو، لە لایەکی تریشەوە کەوتبووە ژێر قەڵەمڕەوی ئەو (دەوڵەتە بێزەنتی)یەی کە دوژمنی سەرسەختی موسڵمانان بوو، ئەمیری ئیمانداران دەیەویست تەنگی پیٚ هەڵچنێتو دەست

---

١ سير أعلام النبلاء (٣/٣٧) إسناده صحيح.

٢ المصدر نفسه (٣/٤٠).

٣ چونکە (محمدی کوڕی ابوبکر)ی برای لە مصر لەلایەن (ابن حدیج)ەوە کوژرابوو....سەرچاوە(كشف المشكل من حديث الصحيحين)ابن الجوزي..١/١٢٦٠...وەرگێڕ.

٤ مسلم، رقم: (١٨٢٨).

بخاتە بینەقاقایەوەو دەرفەتی پێ نەدا هەلی دەستکەوێت‌و هەناسە هەڵکێشێت، جا لەو کاتەدا کە لە ڕۆژهەڵاتەوە فشاری دەخستە سەرو لە دەریای نێوەڕاستدا پەلاماری دوورگەکانی دەدان‌و دەیەویست ڕێگەی بەردەم گرتنی (قوستەنتینیە)ی پایتەختەکەی خۆش بکات–وەکو لە پێشدا باسکرا–، دەبینین کە بڕیاری داوە لە باشوریشەوە واتە لە کەنارە ئاوەکانی باکوری ئەفریقیاوە – کە دەوڵەتی بێزەنتی بە موڵکی خۆی دادەنان– تۆقی بدات، جا هەر لە یەکەم ساڵی حوکومەتەکەیدا کە دەکاتە ٤١ی کۆچی، هێرشێکی سەربازی بە سەرکردایەتی (معاویەی کوڕی حەدیج) بەرەو (ئەفریقیا) بەڕێکرد، ئەمجا لە ساڵی ٤٥ی کۆچیداو بۆ جاری دووەم (معاویەی کوڕی حەدیج)ی بە دە هەزار موجاهیدەوە بەرەو (ئەفریقیا) بەڕێ کردەوە، (معاویەی کوڕی حەدیج) ڕۆیشت تا گەیشتە ئەفریقیاو، (عبدالله ی کوڕی عمری کوڕی خەتتاب‌و، عبدالله ی کوڕی زوبێرو، عبدالملکی کوڕی مەڕوان‌و، یەحیای کوڕی حەکەمی کوڕی عاص‌و)، ژمارەیەکی تریش لە مێرخاسانی قورەیشی لەگەڵدا بوون، (پاشای ڕۆم)یش بتریقێکی بە ناوی (نقفورا)وە ئامادە کردو بە خۆی‌و سی هەزار جەنگاوەرەوە بەرەو ئەفریقیای بەڕێکردو، لە کەنار دەریا دابەزی، (معاویەی کوڕی حەدیج) هێزێکی زۆری بە سەرکردایەتی (عبدالله ی کوڕی زوبێر) بۆ بەرەنگاربوونەوەی بەڕێکرد، ڕۆیشت تا گەیشتە سەر لوتکەیەکی بەرز کە بەسەر دەریایدا دەڕوانی‌و (دوازدە) میل لە شاری (سوسە)[1]وە دوور بوو، کاتێك (نقفورا) گەیشتە ئەوێ بە خۆی‌و بە هێزەکەیەوە بەزی‌و بەبێ جەنگ هەڵقەنراو هەلات، (عبدالله ی کوڕی زوبێر) گەڕایەوە لای (معاویەی کوڕی حەدیج) کە ئەو کاتە لە (جبل القرن) بوو، ئەمجا (معاویە) هێزێکی هەزار کەسی بە سەرکردایەتی (عبدالملکی کوڕی مەڕوان) بەرەو شاری (جەلەولاء)[2] بەڕێ کرد، گەمارۆیداو خەڵکێکی زۆری لە دانیشتوانی شار کوشت‌و بە زەبرو زەنگ فەتحی کرد، هێزێکی تریشی بە (٢٠٠) دوو سەد کەشتیەوە بەرەو (سەقەلیە) بەڕێ کردو، لە ئەنجامدا خەڵکێکی زۆریان لێ گرت‌و دەستکەوتێکی باشیان دەستگیر بوو، ماوەی مانگێکی لێ مانەوە، ئەمجا بە

---

١ شارێکی بچووکە لە (ئەفریقیا)، سی میل لە (قەیرەوان)ەوە دوورە، دەریا لە سێ لای باکوورو باشوورو خۆرهەڵاتەوە دەورەی داوە، معجم البلدان (٣/٢٨٢).

٢ دوو شار بەم ناوەوە ناسراون، یەکیان لە (فارس)ەو حەوت فەرسەخ لە (خانەقین)ەوە دوورە، کەوتۆتە سەر ڕێگەی خۆراسان، لە ساڵی ١٦ك جەنگە بەناوبانگەکەی نێوان موسڵمانەکان‌و فارسەکان لەوێدا ڕوویداوە، ئەمەی لە سەرەوە ناوی هاتووە لە ئەفریقیایەو بیست‌و چوار میل لە (قەیرەوان)ەوە دوورە، معجم البلدان (٢/١٥٦).

دەستکەوتێکی زۆرەوە بەرەو ئەفریقیا گەڕانەوە،[1] دوابەدوای ئەم (فتوحاتە) (معاویەی کوڕی حەدیج) بەبێ بەجێهێشتنی سەرکردەیەك یان کاربەڕێوەبەرێك تێیدا ئەفریقیای بەجێ هێشت‌و هاتەوە (مصر) ، لەم هەڵوێستەی (معاویەی کوڕی حەدیج) وا دەفامرێتەوە کە "(بەربەر)ی دانیشتوانی وڵات لە دژی ڕۆمەکان بوبنە هاوپەیمانی موسڵمانەکان‌و موسڵمانەکانیش لەم کاتەدا هەر ئەوەندەیان بەس بوویێت کە مەترسی ڕۆمەکان لەم ناوچەدا نەهێڵن‌و دووری بخەنەوە،[2] کاتێك (معاویەی کوڕی حەدیج) لە ساڵی ٤٦ی کۆچیدا تەرابلوسی خۆرئاوای فەتح کرد (ڕوەیفعی کوڕی ثابتی ئەنساری) کردە والی ئەوێ‌و، لەوێوە هێرشی کردە سەر (تونس)و ساڵی ٤٧ك چووە ناویەوەو، دواییش دورگەی (جربە)ی فەتح کرد کە (بەربەر)ی تێدا نێشتەجێ بوون،[3] سەرچاوەکان باس لەوە دەکەن کە لەو جەنگەدا خەڵکێکی زۆر دیل کرابوو، (ڕوەیفیعی کوڕی ثابتی ئەنساری) هەستایە سەرپێ‌و حوکمی چوونەلای ژنە دیلەکانی بۆ موسڵمانەکان دەرکردو دەیوت: بەڵام من جگە لەو فەرموودەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) کە لە جەنگی (حونەین)دا فەرموویەتی لەوێ گوێم لێ بوو، هیچ شتێکی ترتان بۆ باس ناکەم، فەرمووی: ((لا يحل لامرئ يؤمن بالله واليوم الآخر أن يسقي ماءه زرع غيره، ولايحل لامرئ يؤمن بالله واليوم الآخر أن يَقَعَ على إمرأة من السبي حتى يستبرئها ولا يحل لامرئ يؤمن بالله واليوم الآخر أن يبيع مغنما حتى يقسم))[4] واتە: حەڵاڵ نیە بۆ کەسێك ئیمانی بە خوداو ڕۆژی دوایی هەبێت کشتوکاڵی خەڵك بە ئاوی خۆی ئاو بدات (واتە لەگەڵ کەنیزەکی ئاوس جوت بێت)، حەڵاڵ نیە بۆ کەسێك ئیمانی بە خوداو ڕۆژی دوایی هەبێت لەگەڵ ژنە دیلێك جووت ببێ هەتا نەزانێ لە عادەی مانگانەی دەرچووە، حەڵاڵ نیە بۆ کەسێك ئیمانی بە خوداو ڕۆژی دوایی هەبێت بەر لە دابەشکرانی بەسەر جەنگاوەراندا و دەرکرانی پێنجیەکی هیچ شتێك لە دەستکەوتەکانی جەنگ بفرۆشێت. ئیتربەم جۆرە درێژەی بە بەڕێوەبردنی کاروباری (تەرابلوس)داو پاشان (مسلمەی کوڕی مخلد) کردی بە والی (مصرو برقە)و، تا لە ساڵی ٦٥ی کۆچیدا کۆچی دوایی کرد لەسەر ئەم پۆستەی مایەوەو،

---

١ البيان المغرب لابن غذاري (١/١٦، ١٧)، الشرف والتسامي بحركة الفتح الاسلامي (ص: ٢٠٩)، حركة الفتح الاسلامي في القرن الاول، شكري فيصل (ص: ١٦١).

٢ تأريخ المغرب وحضارته، حسين مؤنس (١/٨٥).

٣ صفحات من تأريخ ليبيا والشمال الافريقي للصلابي (ص: ٣٣٢).

٤ أبو داود، باب في وطء السبايا (٢/٢١٤)، قال الالباني (حسن).

گۆڕەکەی لە چیای سەوزی (برقە)و لە شاری (بەیزا) دیارو ناسراوە، ئەو دواهەمین هاوەڵ بوو کە لەوێ کۆچی دوایی کرد، هەشت فەرموودەی لە پێغەمبەر (ﷺ)ەوە ڕیوایەت کردوون‌و، یەکێك بوو لە هاوەڵە شەرعزان‌و فتوادەرەکان‌و وتاربێژێکی زارو زمان پاراو بوو.[1]

## دووەم: (عقبەی کوڕی نافع)و فەتحکردنی (ئەفریقیا):

ئەو: (عوقبەی کوڕی نافیعی فەهری)یەو لە سەردەمی (معاویەو یەزید)دا والی (ئەفریقیا) بوو، شاری (قەیرەوان)ی دروست کردو خەڵکی تێدا نیشتەجێ کرد.[2] ئازاو زرنگ‌و دیندار بوو، نەزانراوە کە پلەی هاوەڵایەتی هەبووبێت، ئامادەی فەتحکردنی (مصر) بووەو، نەخشەی بۆ داڕشتووە،[3] (معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان) سەرکردایەتیکردنی بزوتنەوەی فتوحاتی (ئەفریقیا)ی دایە دەست ئەم سەرکردە مەزنە (کە مێژوو لە گۆڕەپانی فتوحاتدا بە نەمری هێشتۆتەوە)، (عوقبە) هەر لە سەرەتاداو لەگەڵ (عەمروی کوڕی عاص) بەشداری غەزای (ئەفریقیا)ی کردبوو، لەم بوارەدا ئەزموون‌و شارەزاییەکی باشی پەیدا کردبوو، (عەمرو) لە کاتی گەڕانەوەیدا بۆ (فوستات) ئەوی بە کاربەڕێوەبەر (بورقە) بەجێهێشت، جا لەوێوە مایەوەو خەڵکی بەرەو ئیسلام بانگ دەکرد، پێدانی پۆستی سەرکردایەتی کردنی سوپای فەتحکەر بۆ کەسێکی وەکو (عوقبەی کوڕی نافیع) هەنگاوێکی سەرکەوتوو بوو بۆ فەتحکردنی تێکڕای باکوری ئەفریقیا، ئەو بە هۆی ئەوە ماوەیەکی درێژخایەن لە (بورقەو زوەیلە)و دەوروبەری مابۆوە، چاکی دەزانی جێگیربوونی کاروباری حوکومەتداری موسڵمانان‌و، بەرگرتن بە هەڵگەڕانەوەی خەڵکی ئەو ناوچە تازە فەتحکراوانە لە دینی ئیسلام، پێویستی بە دامەزراندنی بنکەیەکی چەسپاو هەیە لەوێداو، ئیتر موسڵمانان لەوێوە بۆ غەزاکانیان دەرچن‌و دوای تەواوبوونیان بۆی بگەڕێنەوەو ماڵ‌و خێزانەکانیانی تێدا بحەوێننەوە، جا کاتێك (معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان) سەرکردایەتیکردنی بزوتنەوەی فتوحاتی (ئەفریقیا) پێ سپارد، دە هەزار سواری بۆ ناردو، تەواوی ئەو (بەربەر)انەی ئەوێش کە موسڵمان ببوون هاتنە ڕیزی سوپاکەیەوەو بەمە بوو بە خاوەنی سوپایەکی گەورە.[4] ئیتر لەگەڵ تاقمە سوپایەك بەڕێکەوتو لە (مەغمداش)ی (سرت)[5] هەڵیدا، هەواڵی پێگەیشت کە

---

[1] مدرسة الحديث في القيروان (٤٨٦/١)، صفحات من التأريخ الليبيا والشمال الأفريقي (ص: ٣٣٢).

[2] سير أعلام النبلاء (٥٣٢/٣).

[3] المصدر نفسه (٥٣٣/٣).

[4] الكامل في التأريخ (٤٨٣/٢).

[5] (سرت): شارێکە کەوتۆتە نێوان (بورقە)و (تەرابلوس)، معجم البلدان (٢٠٦/٣).

دانیشتوانی (ودان)[1] ئەو پەیماننامەیان هەڵوەشاندۆتەوە کە لەگەڵ (بوسری کوڕی ئەرتەئە) لەو دەمەدا کە (عەمروی کوڕی عاص) بۆ فەتحکردنی ئەوێی ناردبوو لەسەری ڕێککەوتبوونو، ئیدی ئامادە نەبوون ئەو سەرانەیە بدەن کە بڕیار بوو بیدەن، (عوقبە) بەشێکی سوپاکەی بە سەرکردایەتی (عمری کوڕی عەلی قورەیشیو زوهەیری کوڕی قەیسی بەلوی) بۆ سەر ناردنو، بەشەکەی تری سوپاکەی لەگەڵ خستنو بە ئاڕاستەی (فەزان)[2] بەڕێکەوت، کاتێك لێی نزیك بۆوە داوای ئیسلامبوونی لێکردن، ئەوانیش بە دەم بانگەکەیەوە هاتنو موسڵمان بوون،[3] ئەمجا درێژەی بە فتوحاتەکانی داو کۆشکەکانی (کووار)[4] و (خاوەر)[5] و (غدامس)[6] و چەند شوێنێکی تریشی فەتحکردن،[7] وەك تێبینی دەکرێت، (عوقبە) سوپاکەی لە ناوچە کەناریەکان دوورەپەرێز کردووەو، بە ناوچە نێوخۆییەکانیدا بردووەو شار لە دوای شاری پێ فەتح کردوون، دەردەکەوێت کە ئەو ئەمەی لەبەر ئەوە کردووە، تا (بەربەر)ەکان بە لای خۆیدا ڕاکێشێتو هێزێکی ناوخۆیی بەشەرییان لێ دروست بکاتو دواییش لە دژی بێزەنتیەکانی سەر کەنارەکانیان ڕاست بکاتەوەو کۆتایی بە بونیان بێنێتو دەسەڵاتیان لە ناوچەکەدا بپێچێتەوە.[8]

## سێیەم: دروستکردنی شاری (قەیرەوان):

لە ساڵی ٥٠ی کۆچیدا ئەفریقیای ئیسلامی سەردەمێکی تازەی لەگەڵ (عوقبەی کوڕی نافیع)دا دەست پێکرد، ئەو (عوقبە)یەی لەگەڵ هەبوونی تەمەنێکی کەمدا ئەزموونێکی باشی لەسەر حوکومەترانی (ئەفریقیا) پەیدا کردبوو، سەرنجیدا (بەربەرەکان) بە زۆری هەڵدەگەڕێنەوەو پەیمانەکانیان دەشکێنن، بۆی دەرکەوت تاکە ڕێبازێك بۆ پارێزگاریکردنی ئەفریقیاو بڵاوکردنەوەی ئیسلام تێیدا بریتیە لە دروستکردنی شارێك ببێتە مەڵبەندی موسڵمانانو بنکەی تێدا دەرچوونی سوپای ئیسلام بۆ فتوحات، جا شاری (قەیرەوان)ی

---

١ (ودان) لە باشووری ئەفریقیایەو، دە ڕۆژە ڕێ لە (زوەیلە)وە دوورە، معجم البلدان (٥/٣٦٥، ٣٦٦).

٢ (فزان): هەرێمێکی بەرفراوانی باشووری لیبیایەو، (زوەیلە) پایتەختیەتی.

٣ فتوح مصر (ص: ١٣٢).

٤ هەرێمێکی وڵاتی (سودان)ی خۆرئاوایەو، کەوتۆتە باشووری (فزان)، معجم البلدان (٤/٤٨٦).

٥ (خاوەر): شارێکی باشووری (فزان)ە.

٦ (غدامس): شارێکی باشووری (لیبیا)یەو لەسەر سنووری (جەزائیر).

٧ العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ٢٩٦).

٨ دراسة في تأريخ الأمويين (ص: ٢٨٠).

دروست کردو مزگەوتە گەورەکەی بینا کرد.[١] (عوقبە) بەر لە دروستکردنی شارەکە بەم چەند وتەیەی بۆ سەربازەکانی ڕێی بۆ نەخشەکەی خۆش کرد: نەریتی دانیشتوانی ئەفریقیا ئاوایە کاتێك پێشەوایەك دەچێتە نێویانەوەو بەرەو ئیسلام بانگیان دەکات بە دەم داواکەیەوە دێن هەر کاتێکیش لە نێوانیاندا نەما لە دین هەڵدەگەڕێنەوەو دەچنەوە سەر کوفری پێشدایان، جا ئەی موسڵمانەکان: بە ڕای من دەبێت شارێکی وای لێ دروست بکەین کە تا ئاخیر زەمان ببێتە مەڵبەندی دەسەڵاتی ئیسلام، ئیدی خەڵکەکە لەسەر ئەم ڕایە کۆك بوون‌و بڕیاندا دروستی بکەن‌و سەنگەرنشینی تێدا بکەن‌و، وتیان: بۆ ئەوە درێژە بە جیهادی سەنگەرنیشینمان بدەین لە دەریا نزیك دەبینەوە، (عوقبە) وتی: دەترسێم سەرۆکی (قوستەنتینیە) لە نکاو بەسەریدا بداتو داگیری بکات، بۆیە پێشنیار دەکەم شارەکە هەر هێندە لە دەریا دوور بێت سەنگەرنشینەکان بۆیان دروست نەبێت نوێژەکانیان لە دەریا کورت بکەنەوە،[٢] ئیتر پێی باش نەبوو (قەیرەوان) لەو شوێنەدا دروست بکرێت کە (معاویەی کوڕی حەدیج) پێش ئەو بناغەی بۆ داڕشتبوو، بەڵکو لەگەڵ خەڵکەکە ڕۆیشت تا گەیشتە ئەو شوێنەی کە (قەیرەوان)ی ئەمڕۆی لێیە،[٣] جەنگەڵستانێکی سامناك بوو لەبەر دڕندەو مارو مۆر کەس نەیدەوێرا خۆی لێدا، بۆیە لە خودای گەورە پاڕایەوە ئەم دڕندانە بە خۆشی خۆیان چۆڵی بکەن، ئیدی ناوچەکەیان بەجێ هێشتو تا ئەوەی دڕندەکان دەبینران کە چۆن بێچوەکانیان لەسەر پشت دانابوو‌و ڕادەکەن.[٤]

(یەحیای کوڕی عبدالرحمن ی کوڕی حاتەب) دەڵێ: (عوقبە) لە بانگەوازەکەیدا وتی: هۆ زیندەوەرانی ئەم دۆڵو شیوە! ئێمە بە ویستی خودا لێرە نیشتەجێ دەبین، ئێوە لێرە بڕۆن، سێ جار ئەم بانگەوازەی بۆ کردن، ئیتر درەختێك‌و بەردێکیان نەبینی دەعبایەکی لە بن نەیەتە دەرو بۆی دەرنەچێت، ئەمجا هاتینە نێو دۆڵەکەوەو، ڕووی لە خەڵکەکە کردو وتی: بە ناوی خودا دابەزن،[٥] (عوقبەی کوڕی نافع) پاڕانەوەکانی خێرا وەردەگیران،[٦] خەڵکێکی

---

١ مدرسة الحديث في القيروان (١/٣٨).

٢ البيان المغرب (١/١٩).

٣ العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ٢٧٠).

٤ سير أعلام النبلاء (٣/٥٣٣).

٥ رياض النفوس (١/٩)، معالم الايمان (١/٩)، سير أعلام النبلاء (٣/٥٣٣).

٦ سير أعلام النبلاء (٣/٥٣٣)، پاڕانەوەی (عوقبە) لە خودا بۆ دەرچوونی دەعباکان‌و ئامینکردنی هاوەڵەکانی، ڕیوایەتێکی (صحيح الاسناد)ە.

(بەربەر) بە چاوی خۆیان بینیان کە چۆن دەعباو درندەکان بێچوەکانیان بە دوای خۆدا دەداو هەڵگرتووەو ئەو شوێنە چۆڵ دەکەن، لەبەر ئەمە موسڵمان بوون، ئەمجا خەڵك دەستیان بە بڕینی دارو درەختەکە کردو، (عوقبە)ش فەرمانی کرد شار دروست بکرێتو مزگەوتی تێدا بنیات بنرێت، ئیتر خەڵك تەواوی خانوبەرەو مزگەوتەکانیان دروستکردنو لە ساڵی ٥٥ی کۆچیدا تێیدا نیشتەجێ بوون، (عوقبە) لەنێو خەڵکدا بوو، لە میانەی دروستکردنی شاردا درێژەی بە غەزا دەداو سریەکانی بەڕێ دەکردنو، هێرشیان دەکردو، دەستکەوتەکانیان دەهێنایەوەو زۆرێك لە نەتەوەی (بەربەر) هاتنە نێو دینی ئیسلامەوەو، نەخشەی موسڵمانان بەرفراوان بوو، سەربازانو دانیشتوانی شاری (قەیرەوان) ئارامو ئۆخژنیو دڵنیایی ڕووی تێ کردنو بە دڵو دەروونی قایمو بەهێزیانەوە لەسەر نیشتەجێ بوونیان لەو شارەدا سووربوونو ئیسلامیان تێدا بەرقەرار کرد،[1] (شاری قەیرەوان) بە گوێرەی نەخشەی بیناسازی ئیسلامی دروست کرا، مزگەوتی جومعەو کۆشکی حکومەت دوانە هەڵکەوتبوونو هیچیان لە هیچیان جودا نەدەکرایەوەو بۆ هەمیشە هاوسێی یەکتر بوونو کەوتبوونە ناو دڵی شارەوەو لەناوەندیدا چەقیان بەستبوو موسڵمانان دەورەیان لێدابوون،[2] شەقامی سەرەکی (قەیرەوان) کە بە (السماط الأعظم= کەرپوچڕێژی مەزن) ناوی دەرکردوەو لە نێوان مزگەوتو کۆشکی حوکومەتەوە هەڵبەستراوە، ئەمجا (عوقبە) بۆشاییەکی لە شێوەی بازنەیەکی بەرفراواندا لە دەوری مزگەوت بەجێ هێشتو لە دەرەوەی ئەم بازنەیەدا دەستی بە دابەشکردنی زەوی نیشتەجێ بوون کردو بەپێی نەخشەی هۆزەکان کەرت کەرتی کردو وای لێکرد شارێگەکەی مزگەوتو کۆشکی حوکومەت بگەیەنرێتەوە هەردووك جەمسەری ڕاستو چەپی سنووری شار، نەتەوەی (بەربەر)یش لە هەموو لایەکی (ئەفریقیا)وە کۆچیان کردو بەرەو (قەیرەوان) هاتنو، لە دەوروبەری شار نیشتەجێ بوونو زۆربەشیان هاتنە نێو دینی ئیسلامەوەو، دەستیان بە فێربوونی زمانی عەرەبیو قورئانی پیرۆزو کاروباری دینەکەیان کرد، بەم چەشنە دەبینین بزوتنەوەیەکی بەهێزی بە عەرەبکردنی باکوری ئەفریقیا لە نێوان ساڵانی (٥٠_٥٥ك)یدا لە ئارادا بووە.[3]

---

١ الكامل في التأريخ (٤٨٤/٢).

٢ الأمويون، محمد سيد الوكيل (٧٢/١).

٣ تأريخ المغرب وحضارته (٨٩/١).

١ـ تایبەتمەندیەکانی شوێنی (قەیرەوان):

(عوقبە) بە هۆی چەند هۆکارێکی بەهێزی سیاسی‌و سەربازی‌و ئیداری‌و بانگەوازیەوە بڕیاری دا شوێنی ئێستای (قەیرەوان) دیاری بکات، شوێنە جوگرافیەکەی بەم چەند تایبەتمەندیانە جیادەکرێتەوە:

أ ـ هیچ دەریاو ڕووبارێك لە مەڵبەندی سەرکردایەتی سەربازی (فوستات)ی جیاناکاتەوە، دەکەوێتە سەر ئەو ڕێگا وشکانیەی کە هەردووك وڵاتی (مصر)و (مەغریب) پێکەوە دەبەستێتەوە، دەردەکەوێت (عوقبە) لە دروستکردنی شارو سەربازگەکاندا پەیڕەوی لە بیرو پلانی (عمری کوڕی خطاب) کردبێت، بە چەشنێك کە نابێت هیچ دەریا یان ڕووبار یان پردێك لە مەڵبەندی سەرکردایەتی‌و پایتەختیان جودا بکاتەوە، بەڵکو دەبێ لە قەراغ وشکانیەوە، یان لە وشکانی‌و بیابانەوە نزیکتر بێت.

ب ـ هاتنەوەی ئەو شوێنە لەگەڵ زەینی عەرەبەکان‌و داخوازیە زەروریەکانیاندا، ئەم تایبەتمەندیە لە میانەی وتەکانی (عوقبەی کوڕی نافع)دا دەرکی پێ دەکرێت کە پێی وتن: ئەم شوێنە لەو خاکەوە نزیکە کە وشترەکانتان دەتوانن تێیدا بحەوێنەوە، وتی: زۆربەی وڵاخەکانتان بریتین لە وشتر، وشترەکانیشتان بەسەر دەروازەی لەوەڕگاکانیاندا دەڕوانن،[1] هەروەها لە وتەی هاوەڵانی (عوقبە)شدا دەرکی پێ دەکرێت، کە لە کاتی یەکخستنی ڕای خۆیان لەسەر هەڵبژاردنی ئەو شوێنە بۆ شار وتیان: ئێمە خاوەن وشترین، هیچ پێویستیمان بەوە نیە لە دەریاوە نزیك بین.[2]

ج ـ بە حوکمی ئەوە ناوچەیەکی ئاوەڵگەرەو بە قسەی جوگرافیناسان دارو درەخت‌و ڕووەکی لێ دەڕوێت، بەمەش دەوڵەمەندە بە بەروبوومێکی تایبەت بە خۆیەوە، لە بەرانبەر چیای (ئۆراس)ی سەنگەرو قەڵای هۆزەکانی (بەربەر) هەڵکەوتووە، کەواتە شوێنی (قەیرەوان) لەسەر خاکێکی کشتوکاڵیەوە، سەرچاوەیەکی گرنگی ژیان‌و گوزەرانەو پێداویستی خوردو خۆراکی زەروری بۆ موجاهیدانی ئیسلام جێبەجێ دەکات.[3]

س ـ ڕاستە کە کێشەیەکی سەرەکی ڕووبەڕووی (قەیرەوان) بوبێتەوە –لە دوای دروستکرانی– وەکو (بصره) خۆی لە داهاتی ئاودا نواندووە، هەرچەندە کێشەی نێوانیان

---

١ الروض المعطار (ص: ٤٨٦)، دراسات في تأريخ المدن العربية الاسلامية، د. عبدالجبار ناجي (ص: ٢٥٢).

٢ الاستقصاء لاخبار دول المغرب الأقصى (٧٨/١).

٣ القيروان، للحبيب النجحاني (ص: ٥٩).

جیاواز بووەو، ئاوی (بصرە) هی ڕووبارەکان بوو بەڵام سوێر بوو، هەرچی ئاوی (قەیرەوان)یش بوو بۆ خواردنەوە گونجاو بوو، لە دوو سەرچاوەوە دەهات، یەکەمیان سەرچاوەی باران بوو لە ژمارەیەك کارێزاودا کە پێیان دەوتن (مەواجیل) کۆدەکرایەوەو هەڵدەگیرا، دووەمیان ئاوی دۆڵی (سەراویل) بوو کە لە بەرانبەر شار هەڵکەوتبوو، بەڵام ئەمەیان سوێر بوو، لەبەر ئەمە مێژوونوسێك سەرچەشمەی ئاوی (قەیرەوان)ی سنووردار کردووەو وتوویەتی: خواردنەوەیان بریتی بوو لە ئاوی باران، کە زستان دەهات‌و باران دەباری‌و لافاو هەڵدەستان، ئاو دەهاتە نێو شیوەکانی (بەرك عیزام)ەوە کە (المؤجل)ی پێ دەوترا...

لە بەرانبەر شاریشدا دۆڵێکی تریان هەبوو (سەراویل)ی پێ دەوتراو ئاوی سوێری دەهاتە نێوەوەو، ئەمەیان لە کاتی پێویستیدا لەو شتانەیاندا بەکاردێنا کە پێویستیان پێی دەبوو.[1] لەگەڵ ئەمەشدا وا دەردەکەوێت کە ئەم کێشە ئاڵۆزە بەرەبەرە تا ڕادەیەکی بەرچاو چارەسەر بووەو کەم بۆتەوە.[2]

٢ـ (قەیرەوان) مەڵبەندی شارستانیەتی ئیسلامی (مەغریب)و پایتەختی زانستی ئەوێ:

تا لە ساڵی (٥٠ك)یدا شاری (قەیرەوان) نەکرا، ژیانی زانستیانەی چڕوپڕ لە وڵاتی (مەغریب)دا دەستی پێ نەکرد، ئیتر (قەیرەوان) بە خێرایی بوو بە پایتەختی زانست‌و مەڵبەندی شارستانیەتی ئیسلامی ئەو وڵاتەو لەوێوە بانگخوازان بە دنیادا بڵاودەبوونەوەو لە هەموو لایەکیشەوە زانستخوازان ڕوویان تێ دەکردو بۆی دەهاتن، لەو هۆکارانەی (قەیرەوان)یان بۆ ئەم پایە بەرزە هەڵبژارد ئەمانە بوون:

أـ دروستکردنی شاری (قەیرەوان) بەو واتایە دێت کە ئەفریقیا بۆتە ویلایەتێکی ئیسلامی نوێ‌و پارچەیەکی نەپچڕاو لە جیهانی گەورەی ئیسلامی‌و، لەمەولا موسڵمانان ژیانی ئاسایی خۆیانی تێدا دەگوزەرێنن، کە لە سەرووی هەموویانەوە ژیانی پەروەردەو فێرکردن‌و بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیری ئیسلامیەو، خودی شارەکە سومبولی پەیامێکەو پێویستە لەسەر دانیشتوانەکەی ئەرکی پەخشکردنی ئیسلام لە مەغریبدا بخەنە سەر شانی خۆیان، ئیدی بەم چەشنە چۆن ببوو بە دەریچەی سوپای فتوحات، ئاواش ببوو بە دەریچەی بانگخوازان‌و بە

---

١ القيروان، للحبيب النجحاني (ص: ٥٩).

٢ دراسات المدن العربية الاسلامية (ص: ٢٥٢).

مەبەستی بڵاوكردنەوەی ئیسلام بە چوار لادا بڵاو دەبوونەوە، لە ڕاستیدا هاوەڵان هەر لە سەرەتای دروستكردنەوە هەستیان بەم پلەو پایە بەرزەی (قەیرەوان) كردبوو.[1]

ب ـ لە ڕاستیدا دروستكردنی مزگەوت (جامع) تەواو بوو كە یەكەمین قوتابخانەیە لە ئیسلامدا، بێگومان ئەو هاوەڵانەی لە سوپاكەی (عوقبە)دا بوون –بەو چەشنە خوێندنەی ئەو كاتە لە وڵاتانی خۆرهەڵاتدا باو بوو– لەوێدا دانیشتن‌و دەستیان بە وانەوتنەوە كرد، لە میانەی دروستكردنی (قەیرەوان)دا (عوقبەی كوڕی نافع) هەژدە هاوەڵی لەگەڵدا بوون‌و[2] ماوەی پێنج ساڵی تەواوی تێدا مانەوە، كە بێگومان كاریان بریتی بوو لە: بڵاوكردنەوەی زمانی عەرەبی‌و فێركردنی قورئان‌و سوننەت لە مزگەوتی جامیعی قەیرەواندا، ئەمە لە میانەی دروستكردنی شاری (قەیرەوان)دا بوو، بە جۆرێك لەو كاتەداو لەوێدا غەزای هێندە گەورە لە ئارادا نەبوون كە وایان لێ بكات زۆر لە (قەیرەوان) دوور بكەونەوە، بەڵام لە غەزای دووەمیدا (عوقبە) بیست‌و پێنج هاوەڵی لەگەڵدا بوون،[3] تەواوی سوپاكەی لە شوێنكەوتووان (تابعین) پێكهاتبوو، لەم سەردەمەدا گێڕانەوەی فەرموودەكانی پێغەمبەر (ﷺ) بە شێوەیەكی وا بەرفراوان بڵاوبۆوە كە وای لە (عوقبە) كرد وەسێت بۆ ڕۆڵەكانی‌و موسڵمانانی دوای خۆی بكات فەرموودە لە خەڵكانی متمانەپێكراو وەربگرن‌و خۆیان بە نووسینەوەی شتگەلێكی وا سەرگەرم نەكەن كە لە قورئانی پیرۆزیان بێ ئاگا بكات.[4]

ت ـ (قەیرەوان) خەڵكێكی زۆری لە (بەربەر)ە موسڵمانەكانی بە لای خۆیدا كەمەندكێش كردبوو و، هاتبوون تا فێری ئاینە تازەكەیان ببن، (إبن خلدون) كاتێك باسی (عوقبە) دەكات، دەڵێ: جا چووە نێو ئەفریقیاوەو بەربەرە موسڵمانبووەكان هاتنە نێو ڕیزی هێزەكانیەوەو سوپاكەی گەورە بوو، زۆرینەی نەتەوەی (بەربەر) هاتنە نێو ئایینی ئیسلامەوەو دین جێگیر بوو.[5] بێگومان سەركردەكانی فتوحات كەسانێكی وایان تەرخان كردبوون تا ئەم ئەركە گرنگە ڕاپەڕێنن[6]–و خەڵك بێننە نێو بازنەی ئیسلامەوە–، ئیتر ئیسلام لە (قەیرەوان)ەوە بە تەواوی وڵاتی (مەغریب)دا بڵاوبۆوەو، (عوقبە) بە خاتری

---

١ مدرسة الحديث في القيروان (١/١٥٠).

٢ البيان المغرب (١/١٢٠).

٣ المصدر نفسه (١/٢٣).

٤ شجرة النور (٢/١٠٠)، مدرسة الحديث في القيروان (١/٥١).

٥ تأريخ ابن خلدون (٤/١٨٦).

٦ البيان المغرب (١/٢٧)، مدرسة الحديث في القيروان (١/٥١).

بڵاوبوونەوەی ئیسلام لەنێو نەتـەوەی بەربـەردا ژمارەیـەك مزگـەوتی لـە هـەردووك مـەغریبی ئەوسەر سنوررو نێوەڕاستدا دروست کردن‌و، (شاکر)ی هاوەڵی وەکو مامۆسـتا لـە یـەکێك لـە شارەکانی ناوەڕاستی مەغریبدا بەجێ هێشت تا فێری دینیان بکات،[1] جا دوای عوقبـە (أبـو المهاجر دینار) بوو بە والی ئەفریقیاو (کوسەیلە)و هۆزەکەی بـە لای خۆیـدا کـە کەمەنـدکێش کردو چاکەی زۆری لە بەرامبەر بەربەردا نواند، بە هۆی ئەمە بەربەرەکان پۆل پۆل هاتنە نێو دینی خوداوەو، دوای ئەویش (حسانی کوڕی نوعمان) پشتیوانی لە هەوڵ‌و تەقالاکانی عوقبە کرد بۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلام لـەنێو نەتـەوەی بەربـەرداو، بـە چەشـنێك سـێزدە کەسـایەتی شەرعزانی تـابیعی تـەرخان کـردن تـا زمـانی عـەرەبی‌و فیقـهو بنـەماکانی ئیـسلام فێرییئـەو نەتەوە نۆموسڵمانە بکەن.[2] (موسای کوڕی نوسەیر)یش درێـژەی بـەم ئەرکـە گرنگـە دا، بـە جۆرێك: فەرمانی بە عەرەبەکان کرد بەربـەرەکان فێـری قورئـان بکـەن‌و لـە دینیـان شـارەزا بکەن‌و،[3] بیست‌و حەوت زانای لە مەغریبی ئەوسەر سنوور بەجێ هێـشتن تـا دانیـشتوانەکەی فێر بکەن.[4]

ج – زۆربەی ئەنـدامانی سـوپا خێزانـەکانی خۆیـان لەگەڵـدا بـووو، هـەبوو لـە ئـەفریقیادا کەنیزەکیان دەستکەوتبوو، (أبو العرب) دەڵێ یەکێك لە فەرموودە گێڕەرەوان دەڵـێ: کاتێـك (عبداللەی کوڕی عمری کوڕی خطاب) لەگـەڵ (معاویـەی کـوڕی حـەدیج)دا چـوو بـۆ غـەزا–ی ئەفریقیا–، کـەنیزەکێکی هـاوڕابوو لـەوێ کـچۆڵەیەکی لێ بـوو پاشـان مـردو، لـە گۆڕسـتانی قورەیش‌و لە دەرگای (سلم) ناشتی، ئیتر دوای ئەمە قورەیشیەکان ئەوێیان بـە هـۆی گـۆڕی ئەو کچەوە کرد بـە گۆڕسـتانی مردووەکـانی خۆیـان،[5] لێرەشـدا پێویـست بـوو نـەوەی تـازە پێگەیشتووی موسڵمان بایەخی پێ بدرێت‌و بنەماکانی ئیسلام‌و زمانی عـەرەبی فێـر بکرێـت، لەبەر ئەمە هەر لە سەرەتای کارەوە چینی قوتابی‌و خوێندکار لە (قەیرەوان)دا سەری هەڵدا، لە (غیاثی کـوڕی شـبیب)ەوە گێڕدراوەتـەوە کـە وتوویـەتی: ئێمـە لـە کاتێکـدا مێردمنـداڵ بـووین‌و بـە فەقێیـەتی لـە (قـەیرەوان) دەمانخوێنـد، (سـوفیانی کـوڕی وەهـەب)ی هـاوەڵی پێغەمبەری خودا (ﷺ) مەندیلێکی لەسـەر بـوو لـچقێکی بـەنێو دوو شـانیدا شـۆڕبیۆوەو بـە

---

١ مدرسة الحديث في القيروان (١/٥٢).

٢ البيان المغرب (١/٤٢).

٣ البيان المغرب (١/٤٢).

٤ الرياض (١/٩١)، مدرسة الحديث في القيروان (١/٥١).

٥ مدرسة الحديث في القيروان (١/٥٢).

پەناماندا ڕادەبوردو سەلامی لێ دەکردین،[١] (سوفیانی کوڕی وەهەب) دوو جار بۆ (قەیرەوان) چووبوو، جاری یەکەم لە ساڵی ٦٠ کۆچیو پێنج ساڵ دوای دروستکردنی شارو جاری دووەم لە ساڵی ٧٨ کۆچیدا بوو.[٢]

س ـ شوێنی جوغرافی قەیرەوان ڕۆڵێکی گەورەی گێڕا لە فراژووبوونو گەشەسەندنی ژیانی زانستو زانیاری، لە ناوەندی ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا هەڵکەوتبوو، زانایانو فێرخوازانی مەغریبو ئەندەلوس لە کاتی چونیان بۆ خۆرهەڵات بەوێدا تێدەپەڕینو گوێیان لە زاناکانی ئەوێ ڕادەگرت،[٣] لە کاتی گەڕانەوەیاندا شیاوی ئەوە دەبوون کە زانست ببەخشنو خەڵکی شار گوێیان لێ ڕادەگرتن، بە هەمان جۆر هەر کات خەڵکانی خۆرهەڵات نیازی چوونە مەغریبو ئەندەلوسیان هەبوایە دەبوایە بچووبانە نێویەوەو بەوێدا تێپەڕیبانایە.[٤]

ش ـ بازاڕو بازرگانی لە (قەیرەوان)دا گەرم بوو، کاڵاکان زوو ساغ دەبوونەوە، لەبەر ئەمە گەورە بازرگانانی خۆرهەڵاتو خۆرئاوا –کە زۆربەیان فەرموودەناسو شەرعزان بوونو– پێشەوایەتی ئەم جوڵانەوەیان دەکرد، ئەمە هۆکارێکی یەکجار گرنگ بوو بۆ گەشەسەندنی ژیانی زانستیانە لە (قەیرەوان)دا.[٥]

ص ـ بە حوکمی ئەوە (قەیرەوان) لەو کاتەدا پایەختی سیاسی (ئەفریقیا) بوو، زانستو زانیاریو ژیانی ڕۆشنبیری هێندەی تر لەوێدا گەشەی سەند، چونکە هەر کاتێك والیەکی تازەی بۆ دەهات کۆمەڵێك زاناو ئەدیبی تازەشی لەگەڵ دەهاتن، هەروەك چۆن زۆرێك لە زانایانی بواری (فەرموودەو فیقە)یش لەگەڵ ئەو پۆلە سوپایانە دەهاتن کە لە خۆرهەڵاتەوە بەرەو پایەختی ئەفریقیا تا نیوەی سەدەی دووەمی کۆچی هاتنیان بەردەوام بوو، ئەمە وێڕای ئەوە کە ژمارەیەك لەچینی شاعیرو ئەدیبان بە مەبەستی مەتحو سەناو سەرەخۆشیکردن لە والیەکان سەردانی ئەوێیان دەکرد.[٦]

ل ـ بەو پێیەی دانەی (قەیرەوان) لە لایەن هاوەڵانی پێغەمبەری خودا (ﷺ)ەوە بنیات نراوەو، ئەوانیش لەو میانەدا کەراماتێکی زۆریان لێ دەرکەوتووەو هەندێکیشیان ماوەیەك لە

١ أسد الغابة، نقلا عن مدرسة الحديث في القيروان (٥٢/١).

٢ مدرسة الحديث في القيروان (٥٣/١).

٣ المصدر نفسه (٥٣/١).

٤ المصدر نفسه (٥٣/١).

٥ مدرسة الحديث في القيروان (٥٣/١).

٦ المصدر نفسه (٥٤/١).

ژیانی خۆیانیان تێدا گوزەراندووەو، دواهەمین شاریشە لە وڵاتی مەغریبدا هاوەڵانی هاتبنە نێوەوە، ئەوا جۆرێك لە ڕێزو گەورەیی وەرگرتبوو،[1] هەموو ئەمانە (قەیرەوان)یان سازو باز کرد تا ڕۆڵی پێشەنگایەتی زانستو ڕۆشنبیری لە ئەفریقیاو مەغریبدا بگێڕێت، تا ئەوەی (أبو إسحاقی جەبنەیانی) بەم چەشنەی وەسف دەکاتو دەڵێ: (قەیرەوان) کەللەسەرەو شوێنەکانی تریش ئەندامەکانی تری جەستەن، بە تەنها خەڵکی ئەوێ بوون بەرپەرچی گومانو بیدعەکانیان دایەوەو، بە تەنها پێشەواکانی ئەوێ بوون لە پێناو زیندووڕاگرتنی سوننەتدا جەنگیان کردو خۆیان خۆیان کردە قۆچی قوربانی،[2] نوسەرانی پێشین زمانیان بەوە ڕاهاتووە کە لە بواری زانیاریو ڕۆشنبیریدا (قەیرەوان) بەسەر تەواوی شارەکانی وڵاتی مەغریبدا هەڵبژێرن، (ماقدیشی) لە وەسفی (قەیرەوان)دا دەڵێت: سەرچاوەی حکومەتداریو زانیاری بوو، بۆ دانیشتوانی مەغریب بنچینەی هەموو خێروبێرێك بوو، باری هەموو وڵات لەسەر شانی ئەو بوو، هەر چڵەپۆپەیەك لە وڵاتدا بەرز بووبێتەوە ڕەگو ڕیشاڵەکەی لەوێوە هاتووە، هەر لقێك پەلوپۆی بە چواردەورەی وڵاتدا بڵاوبێتەوە لەسەر قەدی دارە گەورەو بە بەرەکەی قەیرەوان بەرز بۆتەوە، چۆن وا نەبێت کە لە کاتێکدا دەبینین هەموو چەشنە زانستێك لەو مەڵبەندەوەو لە لایەن پێشەواکانیەوە بەسەر وڵاتدا پەخشان دەکرا، چ تاك چ کۆ لامو جیم لەسەر ئەوە ناکەنو، بە درێژایی ڕۆژگاریش لەم بوارەدا هیچ مەڵبەندێکی تری ئەو وڵاتە شانی لە شان نادات.[3]

بەم چەشنە (قەیرەوان) بوو بە خانەی زانیاری ئەفریقیاو ،گەورە زانایانی بواری (فەرموودەو فیقهو قیرائات)ی تێدا دەرکەوتنو، خەڵکی (مەغریبو ئەندەلوس) بۆ فێربوونی زانست گەشتیان بۆ دەکرد، دانیشتوانەکەی بەرگریان لە مەزهەبەکانی پێشین دەکردو، ئیترئەو شارە لە وڵاتی مەغریبدا بوو بە مەڵبەندی سەرەکی ئەهلی سوننەتو جەماعەتو،[4] ڕۆڵێکی گەورەو کاریگەریشی گێڕا لە فەتحکردنی هەموو باکوری ئەفریقیاو ئەندەلوسو بڵاوکردنەوەی ئیسلام لە وڵاتی مەغریبداو، بوو بە گرنگترین مەڵبەندی نێومەڵبەندەکانی شارستانیەتی ئیسلامی.[5]

---

١ المصدر نفسه (١/٥٤).

٢ مناقب أبي إسحاق الجبنياني (ص: ٦٠، ٦١).

٣ حسن البيان للشيخ محمد النيفر (ص: ١٨٩).

٤ مدرسة الحديث في القيروان (١/٥٥).

٥ العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ٢٧٠).

## چوارەم: لێخرانی (عوقبە) لە پۆستی ویلایەتو هاتنە سەرکاری (أبوالمهاجری کوڕی دینار) لە ساڵی ٥٥ کۆچیدا:

لە کاتێکدا (عوقبە) سەرگەرمی درێژەدان بە فتوحاتەکانیو ڕێکخستنی شارە تازەکەی بوو، (مسلمەی کوڕی مخلدی ئەنساری)ی والی (مصر) بڕیاری لەسەر کار لابردنی بۆ دەرکردو (أبو المهاجر)ی خزمەتکاری خۆی لەجێ دانا، کاتێك بە (مسلمە)یان وت: دەبووایە (عوقبەت) لەو پۆستەیدا بهێشتبایەوە: چونکە شیاوو ڕەندە! لە وەڵامدا بە ڕاشکاوی وتی: هەتا ئێستا (ئەبو موهاجیر) بەبێ هیچ پۆستو دەستکەوتێك لەگەڵی هێناوینو ئارامی گرتووە، ئێمە حەز دەکەین پاداشتی بدەینەوە،[١] کاتێك (عوقبە) لێخرا، بە ڕەنجاوی بەرەو (دیمەشق)و بۆ لای معاویە چوو، پێی وت: وڵاتەکەم فەتح کردو خانوبەرەو کۆشكو تەلارو مزگەوتی جومعەو جەماعەتم تێدا دروستکردنو دانیشتوانەکەی بە تەواوەتی ژێر فەرمانم بوون، ئەمجا کۆیلەکەی (مسلمەی ئەنساری)ت بۆ لا ناردمو بە ناشیرینیو ناشیاوی لە پۆستی دابەزاندم، جا (معاویە) عوزری بۆ هێنایەوەو پێی وت: هەڵوێستی بەرزی مسلمەی کوڕی موخەللەدم لە بەرانبەر خەلیفە (عوسمان)ی ستەملێکراوم لەبەر چاو بوو، لە یادم بوو کە چۆن لە پێناو سەندنەوەی خوێنی ئیمامدا گیانی خۆی لەسەر لەپی دەستی دانابوو،[٢] ئیدی (معاویە) بەڵێنی بە (عوقبە) دا کە بیباتەوە سەر پۆستەکەی، بەڵام وەکو (إبن عذاري) دەڵێ: کارەکە خایاندیو وەکو خۆی مایەوە تا (معاویە) کۆچی دوایی کردو، کارەکەی حەواڵەی (یەزید) کرد، جا (یەزید) (عوقبە)ی خستەوە سەر پۆستی خۆیو جارێکی تر بووەوە بە والی ئەفریقیا.[٣] لێرەدا لەم بابەتەدا خاڵێك هەیە، کە بریتیە لەو هەڵوێستە خراپەی کە عوقبە لە کاتی لەسەرکارلابرانی لە لایەن (أبو المهاجر)ەوە لە بەرانبەریدا ئەنجام دراوە، سەرچاوەکان باس دەکەن کە (أبو المهاجر) خراپەیەکی زۆری لە بەرانبەر عوقبەدا کردووەو زیندانی کردووەو بارە ئاسنی بەکۆڵ داداوە.[٤] ئێمە نازانین (أبو المهاجر) بە چ پاڵنەرێك ئەمەی ئەنجام داوە؟

---

١ فتوح مصر (ص:١٣٤)، البيان المغرب (٢٢/١).

٢ فتوح مصر (ص: ١٣٤).

٣ البيان المغرب (٢٢/١)، العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ٢٧١).

٤ فتوح مصر (ص:١٣٣، ١٣٤)، البيان المغرب (٢٢/١).

(د. عبدالشافي محمد عبداللطيف) لە کتێبە بە نرخەکەیدا دەڵێ: نازانین چ شتێك وای لە (أبو المهاجر) کردووە ئەم کارە بکات؟ بە لامانەوە سەختەو گرانە ئەو تۆمەتەی (د. حسين مؤنس) خستویەتیە پاڵ (مسلمەی کوڕی مخلد) قبوڵ بکەین: کە دەڵێ ئەو هانی (أبو المهاجر)ی داوە تا بە خراپە لەگەڵ (عوقبە) ڕەفتار بکات،[1] چونکە ئەم تۆمەتە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە، بە تایبەتی کە (عبدالحکم) سەبارەت بە (مسلمە) دەڵێ: کاتێك ئەو (أبو المهاجر)ی کردە والی (مەغریب): وەسیّتی بۆ کرد، کە بە شێوەیەکی جوانو لە بار داوا لە (عوقبە) بکات لە پۆستی ویلایەت دابەزێت، بەڵام (أبو المهاجر) سەرپێچی کردو بە شێوازێکی خراپ لێی خستو ئاسنی لێ بار کرد، بەم شێوەیە مایەوە تا نامەی لە لایەن خەلیفەوە بۆ هات کە فەرمانی دابوو ئازادی بکاتو بۆ لای خۆی بگێڕێتەوە،[2] ئەمجا دەڵێ: (مسلمە) لە کاتی تێپەڕینی (عوقبە) بە (مصر)دا سواری وڵاخەکەی بوو چووە سەر ڕێگایو داوای گەردن ئازادی لێکردو، سوێندی بۆ خوارد کە (أبو المهاجر) پێچەوانەی فەرمانی ئەو مامەڵەی لەگەڵدا کردووەو، پێی وت: وەسیّتم بۆ کردبوو بە تایبەتی لەگەڵ تۆدا بە جوانی ڕەفتار بکات،[3] بەڵام بۆچی (أبو المهاجر) -کە لە کاتێکدا بە خودی خۆی ڕێزی زۆری لە (عوقبە) دەگرتو پلەو پایەی بەرزی ئەوی دەزانی- بە پێچەوانەی وەسیّتی سەییدەکەی ڕەفتار دەنوێنێتو بەم شێوازە خراپە لەگەڵ (عوقبە)دا دەجوڵێتەوە؟ لە کاتێکدا (عوقبە) دوعای لێکرد داچڵەکاو وتی: ئەمە پیاوێکە نزاکانی ڕەت ناکرێنەوە!، ئەمە پرسیارێکەو ئێمە هیچ وەڵامێکی تەواومان لەسەری نیە... تەنها ئەو ئەنجامگیریە نەبێت کە (محمد علي دبوز) بە دەستی خستووە: کە دەڵێ: پێ دەچێ (أبو المهاجر) زۆر ناچار بووبێت (عوقبە) دەستگیر بکاتو پاشانیش بیخاتە بەندیخانەوە، دیارە دوای ئەوە کە (عوقبە) لە گژی هەڵچۆتەوە بە ئاسانی دەستبەرداری دابەزین نەبووە لە پۆستەکەیو پێی وابووبێت کە ئەو بۆ ویلایەتو سەرکردایەتی لە (أبو المهاجر) شایانترە، ڕەنگ بێ (أبو المجاهر) بە هۆی فەرمانبەرداری نەکردنی (عوقبە) بۆ ئەو لەوە ترسابێت ناکۆکی لە نێوان موسڵماناندا سەر هەڵبداتو لە ئەنجامدا دوژمنەکانیان (واتە ڕۆمەکان) بیکەنە هەلو بە باری بەرژەوەندی

١ فتح العرب للمغرب (ص: ١٥١).

٢ فتوح مصر (ص: ١٣٣، ١٣٤).

٣ فتوح مصر (ص: ١٣٤).

خۆیاندا بیشکێننەوە، ئیتر بە خاتری ئەمەو دروست نەبوویێت هیچ کەلێنێك لە نێوان موسڵماناندا ناچار بوویێت بەندی بکات.[1]

ئەم ئەنجامگیریە بە هەر حاڵ پی دەچێ ڕاست بێو عەقڵ دەیگرێت، چونکە هەر موسڵمانێك داکۆکی لەسەر بڵاوبونەوەی گیانی ڕێزو شکۆداری لە نێوان سەرکردەکانی ئیسلامدا بکات –ئیدی ناکۆکیەکانیان لە هەر ئاستێکدا بووبن– ئەوا هەوڵ دەدا لەو لۆمەو ڕەخنانەش کەم بکاتەوە کە ئاراستەی (أبو المهاجر) کراون، چونکە هەر کامێك لە پاشینەی ئەو سەرکردانە دەبێ هەوڵێ دابێت –لە باتی خراپەنواندنو ئاڵوگۆڕکردنی خەشمو قین– سوود لە هەوڵو ئەزموونەکانی پێشینەی خۆی وەربگرێتو، هەر پێشینەیەکیش لەوان دەبێ داکۆکی لەسەر بەخشینی ئەزمونو شارەزاییو ئامۆژگاریەکانی خۆی کردبێت بۆ ئەو سەرکردەی کە بە دوای ئەو داهاتبێت، هەموو ئەمە بە خاتری ئەوە لە ڕاپەڕاندنی کارە گرنگەکانیدا سەرکەوتبێت، چونکە هەرهەموویان یەك ئامانجیان هەبووە کە بریتی بووە لە جیهادکردن بۆ خوا تا ئاڵاکەی بەرز بکەنەوەو ئاینەکەی بە دونیادا پەخش بکەن.[2]

## پێنجەم: فتوحاتی (أبو المهاجری دینار) ٥٥ـــ٦٢ك:

هەرچەندە (أبو المهاجر) هەڵەیەکی گەورەی دەرهەق بە (عوقبەی کوڕی نافع)ی والیو موجاهیدی گەورەی پێش خۆی ئەنجام دا، بەڵام ویژدان وادارمان دەکات کە بڵێین: ئەو ڕۆڵێکی گەورەی گێڕا لە فەتحکردنی (مەغریب)و وای لێکرد ئیسلام بە دینو سیستەمی ژیانی خۆی قبوڵ بکات، لە ڕاستیدا (أبو المهاجر) لە زیرەکیو سیاسەتمەداریو جوان هەڵسوکەوتکردندا هەتا بڵێی دەوڵەمەندو بەهرەمەند بوو، بەو بیرەتیژەو دووربینیەی پێی وابوو کە پێویستە ئەو سیاسەتە توندو تیژەی (عوقبەی کوڕی نافیع) لەسەری دەڕوات دەبێ گۆڕانی بەسەردا بهێنرێتو، دەبێ لە جیاتی ئەوە سیاسەتێك پەیڕەو بکرێت کە دڵەکان کەمەندکێش بکاتو سەرنجی دانیشتوان بە لای ئیسلامو حوکومەتەکەیدا ڕاکێشێت، (بەربەر) نەتەوەیەکی توندو تیژنو بە هۆی ئەوە ئازادو سەربەست بوون هەموو شتێکیان پێ قبوڵ ناکرێت، کەواتە نەرمی نواندن لە بەرانبەریاندا لە نواندنی سیاسەتی توندوتیژی چاکترو بەسودترە، لە لایەکی ترەوە (أبو المهاجر) زانی کە ئەوانەی لە باکوری ئەفریقیاداو لە دژی موسڵمانەکان دەست لە پشتی بەربەرەکان دەدەنو گەلەکۆمەی سەر ئەوانیان پێ دەکەن

---

١ تأريخ المغرب الكبير (٢/٣٢، ٣٣).

٢ العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ٢٧٤).

بریتین لە ڕۆمەکان، ئیتر (أبو المجاهر) لە میانەی هەڵسوکەوت لەگەڵ (بەربەر)دا سیاسەتی ئەرمونیانی ڕەچاوکردو بەمە سەرکەوتنێکی گەورەی بۆ خۆی تۆمار کرد.[1] ئەو بەم سیاسەتەی پەردەی لەسەر نێوەڕۆکی ڕۆم هەڵدایەوەو قەناعەتی بە (بەربەر)ەکان کرد کە ڕۆمەکان خۆشەویستی ئەوان نین‌و، موسڵمانەکانیش بە ئامانجی داگیرکردنی خاکیان‌و کۆیلەکردنی خۆیان‌و بردنی سەروەت‌و سامانیان نەهاتونەتە وڵاتیانەوەو ئەوەی ڕۆمەکان لەم بارەوە دەیڵێن درۆیە، بەڵکو ئەوان تەنها بۆیە هاتوون هەتا بەرەو خێرو چاکە ڕێنمایان بکەن‌و بەرەو ئیسلامێك بانگیان بکەن کە کامەرانی ئەوانی تێدایەو، هاریکاریشیان دەکەن تا لە کۆتی کۆیلایەتی ئەو دەوڵەتی (ڕۆم)ەیان ڕزگار بکەن کە ماوەی چەند سەدەیەکە وڵاتیان لێ داگیر کردوون‌و سەروەت‌و سامانیان بە تاڵان دەبەن، (ڕۆمەکان) هەرچەندە لە نێوەڕاست‌و خواروی ئەفریقیادا شکستیان خواردبوو، بەڵام لە باکوردا هێزێکی گەورە بوون‌و (قرتاجنەی عەذرا) پێگەو پایتەختیان بوو هێزی هیچ کامێك لە سەرکردەکانی فتوحاتی پێ نەگەیشتبوو، ئەمجا لە (ساحیل)ی مەغریبیشداو هەر لە (بنزرت)ەوە تا (تەنجە) هێزی ئەوانی تێدا بوو، جا (أبو المجاهر) لەسەری پێویست بوو گورزێکی هێندە بەهێزو کاریگەریان لێ بوەشێنێت دەسەڵاتیان لەو ناوچانەدا لەق بکات‌و ئەو هاوپەیمانیەتەش بشکێنێت کە لەگەڵ (بەربەر)دا بەستوویانە، لەبەر ئەمە بەرەو (قرتاجنە) بەڕێکەوت‌و لە دەوەروبەریدا هەڵیدا،[2] ڕۆمەکان دەروازەکانی شاریان داخستن‌و خۆیان لە قەڵاو شورە بەرزەکاندا قایم کرد، (أبو المهاجر) ئابلۆقەی سەر شاری لێ توند کردن، ڕۆمەکان بۆیان دەرکەوت کە ئەوان بە سوپای ئیسلام ناوێرن‌و، لە ئەنجامدا (أبو المهاجر) هەر سەردەکەوێت‌و، بە دەسەڵات‌و هێزی تەواویەوە دێتە نێو پایتەختەوە، لەبەر ئەمە داوای سوڵحیان کرد، ئەویش لە بەرانبەر چۆڵکردنی دورگەی (شریك)[3]دا تا هێزەکانی خۆی تێدا جێگیر بکات سوڵحی لەگەڵ کردن، مەبەستی (أبو المهاجر) لە داگیرکردنی دورگەی (شریك)ی نزیك (قرتاجنە) ئەوە بوو، تا چاودێری جموجۆڵی ڕۆمەکان بکات، لەبەر ئەمە هێزێکی پاسەوانی سوپای بە سەرکردایەتی (حنش الصنعاني) تێدا بەجێ هێشت‌و ڕێنمایی کردن هەر کاتێك ڕۆمەکان هەوڵیاندا پەلاماری موسڵمانەکان

---

١ تأريخ المغرب الكبير (٢/٣٣).

٢ النجوم الزاهرة (١/١٥٢).

٣ بەم ناوە ناسراوە، چونکە خراوەتە پاڵ (شريك العبسي)، دەکەوێتە خۆرهەڵاتی (قرتاجنە)، تأريخ المغرب الكبير (٢/٣٤).

بدەنو بەریان پێ بگرنو هەوڵەکانیان لێ پوچەڵ بکەنەوە،[١] (أبو المهاجر) پاش سەندنی دورگەی (شريك)ی ستراتیژی گەمارۆی لەسەر (قرتاجنه) لابردو، بە مەبەستی دڵنیاکردنو پشت ئەستورکردنی موسڵمانانو، چاودێری کردنی جموجوڵی ڕۆمەکان هێزێکی پاسەوانی لەو دورگەیەدا بەجێ هێشت، ئەمجا بە ئاراستەی ساحیلی ناوچەی خۆرئاوا بەڕێکەوت، ڕۆمو بەربەر ویکرا لیی ترسانو نەیانتوانی پێشی پێ بگرنو ڕووبەڕووی ببنەوە، ڕۆیشت تا گەیشتە شاری (ميله)،[٢] کە بە دووری پەنجا میل لە (بجايه)[٣]ی خوارووی خۆرهەڵاتیەوە هەڵکەوتووە، تەماشای کرد خۆی بۆ جەنگ ساز کردووەو خەڵکەکەی کە لە ڕۆمو بەربەر پێکهاتبوون خۆیان تێدا دامەزراندبوو، (أبو المهاجر) بۆیان چووە مەیدانەوەو لە ئەنجامدا فەتحی کردو دەستکەوتێکی زۆری دەستگیر بووو هێزەکانی خۆی تێدا جێگیرکردن، (ميله) بە حوکمی ئەوە کەوتبووە نێوەڕاستی هەردوك مەغریبی خواروو نێوەڕاست، ئەوا بە چاکترین شوێن دادەنرا تا چاودێری جموجوڵەکانی بەربەرو ڕۆمو هاوپەیمانەکانی لێوە بکرێت، لەبەر ئەمە کردی بە بارەگای خۆیو نزیکەی دوو ساڵی تێدا مایەوە، توانی لەم ماوەیەدا پەیوەندی بە بەربەرەکانەوە بکاتو ڕاستەقینەیی ئیسلامیان پێشان بداتو داوایان لێ بکات بە دینی خۆیانی قبوڵ بکەن، لەم سیاسەتەیدا سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێناو، بەربەرەکان ڕوویان لە ئیسلام کرد، نیشانەی ئەمە ئەوەیە: کە مێژوونووسان باسیان لە هیچ جەنگو کوشتارێك نەکردووە کە لەم ناوچانەی مەغریبداو لە قوستەنتینیەی ئێستاو دەوروبەریەوە تا دەگاتە (بجايه) ڕوویان دابێت.[٤] چونکە ڕۆمەکان بە هۆی بەربەرەکانەوە خۆیان بەهێز دەکردو ئەوەش (أبو المهاجر)ەو توانی لە ڕاکێشانی بەربەر بە لای خۆیدا سەرکەوتن بەدەست بێنێتو لە ڕۆمەکانیان جیابکاتەوە، ئیدی چۆن دەریا دوای تۆفان ئارام دەگرێت ئاواش ناوچەکە ئارام بۆوە،[٥] هەواڵ لەسەر هەواڵ بە (أبو المهاجر) دەگەیشت کە کۆمەڵێك لە ڕۆمو بەربەر خۆیان بۆ پەلاماردانی ئەو ساز دەکەن، بڕیاری دا بەرەو ڕوویان بڕوات، هۆزی (ئۆربە)[٦] کە پێکهاتەیەکی گەورەی پێکتاهەکانی (بەربەری بڕانس) بوون

---

١ تأريخ المغرب الكبير (٢/٣٤)، العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ٢٧٦).

٢ النجوم الزاهرة (١/١٥٢)، العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ٢٧٧).

٣ (بجايه) لەسەر کەناری دەریایە، کەوتۆتە نێوان تونسو مەغریب، معجم البلدان (١/٣٣٩).

٤ تأريخ المغرب الكبير (٢/٣٥).

٥ تأريخ المغرب الكبير (٢/٣٥)، العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ٢٧٧).

٦ تأريخ ابن خلدون (٦/١٤٦)، تأريخ المغرب الكبير (٢/٣٨).

سەرکردایەتی هەردووك مەغریبی نێوەڕاستو سەروی دەکرد، (کوسەیلەی کوڕی لمزم) سەرۆکی ئەم هۆزە بوو، خاوەن کەسایەتیەکی بەهێزو دڵێکی بە ئاگاو مێشکێکی زیرەك بوو، لەسەر نیشتمانەکەی بە جواب بوو و، تا بڵێی ئازا بوو، بەربەرەکان بە گەورەیان دادەناو خۆشیان دەویست، لەسەر ئاینی نەسرانی بووو، پێیەوە پابەند بوو، هیچی سەبارەت بە ئیسلام نەدەزانیو موسڵمانانی وەکو خۆیان نەدەناسین، ڕۆمەکان بە پێچەوانەیان تێگەیاندبوو، بۆیە پێی وابوو ئیسلامو موسڵمانان دوژمنی ئاینو نیشتمانەکەنیو، (أبو المهاجر) کە لە (میله) بەرێکەوتووەو دەیەوێت بە تۆبزی مەغریبی نێوەڕاستو سەرو زەوت بکات، لەبەر ئەمە (کوسەیلە) بەنێو بەربەرەکاندا دەگەڕاو بانگەشەی بەگژداچوونەوەی موسڵماکەنانی دەکردو داوای لێدەکردن خۆ بۆ جەنگی ئەوان ساز بکەنو لە وڵاتی خۆیانیان بەدەرنێن، بەربەرەکان بەوپەڕی گەرمو گوڕیەوە بۆ شۆڕشی (کوسەیلە)ی فەرمانڕەوایان خرۆشانو جلوبەرگو زرێی جەنگیان پۆشیو خۆیان بۆ ڕووبەڕووبوونەوە ئامادە کرد، بەم چەشنە ڕەشەسوپایەکی گەورە بۆ (کوسەیلە) لە بەربەرو ڕۆم جەم بوو.[1]

١ـ جەنگی تەلمەسان[2]: دوابەدوای ئامادەباشیە سەربازیەکەی (کوسەیلە) سوپاکەی لە تەلمەسان کۆکردەوەو، چاوەڕێی سەعاتی سفرو پێکهەڵشاخانی هێزەکەی خۆیو هێزەکەی (أبو المهاجر)ی دەکرد، هێندەی نەخایاند، (أبو المهاجر) گەیشتو سوپاکەی خۆی لە دەوری تەلمەسان دامەزراند، هەردووك سوپا پێککەیشتنو جەنگێکی سەختو خوێناویان دەستپێکردو کار بەوە گەیشت بەدەست یەکترەوە شپرزە بوونو، دەرکیان بە سامناکیو تاڵی جەنگەکە کرد، سەربازگەلێکی زۆر لە هەردوولا کوژران، ئەمجا خودای بەرزو مەزن سەرکەوتنی خۆی بۆ موسڵمانەکان نارد، ئەوانیش سوپای (کوسەیلە)یان شکاندو ناچار بە هەڵاتنیان کرد.

٢ـ موسڵمان بوونی (کوسەیلە): (کوسەیلە) لە جەنگی تەلمەساندا دیل کراو بۆ لای (أبو المهاجر)یان برد، ئەویش بە ڕێکوپێکی پێشوازی لێکردو لە خۆی نزیك کردەوەو چۆن ڕەفتار لەگەڵ پاشایەك دەکرێت بەو چەشنە ڕەفتاری لەبەرانبەر نواند،[3] تەماعی لە موسڵمانبوونی کرد، سەبارەت بە (ئیسلام) قسەی بۆ کردو ڕاستەقینەییو نێوەرۆکەکەی بۆ خستەڕوو، کە

---

١ تأريخ المغرب الكبير (٢/٣٨).

٢ ناوە بۆ دوو شار، یەکیان کۆنەو ئەوی تریشیان تازەیەو لە لایەن (مرابطون)ەوە نەخشەی کێشراوە، وەکو (فسطاط)و (قاهرة)ی مصر، معجم البلدان (٢/٤٤).

٣ تأريخ المغرب الكبير (٢/٣٨).

بریتیە لە ئایینی یەکخوداناسی پاكو پوختو دادو یەکسانیو برایەتی، تێی گەیاند: کە ئەگەر موسڵمان بێت نەك هەر زیانی لێ ناکەوێت، بەڵکو لەمەولا قازانج دەکاتو خێروبێرێکی زۆرو زەوەندی مادیو مەعنەوی دەست دەکەوێت، (کوسەیلە)ش پیاوێکی زیرەكو دووربین بوو، دڵسۆزی گەلەکەی بوو، جگە لە بەرژەوەندیو خێروبێر خوازیاری هیچ شتێکی تر نەبوو بۆیان، جا (کوسەیلە) موسڵمان بوو، هاتە نێو ڕیزی موسڵمانانەوەو مەراقی کەوتە سەر زمانی عەرەبیو خۆی بە فێربوونیەوە سەرگەرم کرد، ئیدی بوو بە یەکێك لە کەسە هەرە نزیکەکانی (أبو المهاجر)، خۆی بۆ سەرخستنو پشتیوانی لێکردنی ئیسلامو موسڵمانان گورجو گۆڵ کردو، بانگەشەی گەلەکەی کرد دینی خاوێنو بێ خەوش قبوڵ بکەن، ئیتر بەربەرەکان باوەشی دڵو هەناویان بۆ ئیسلامو موسڵمانان کردەوە، (أبو المهاجر)یش پاش دڵنیابوونی لە جێگیربوونی پایەی کاروبارەکانی لە مەغریبی نێوەڕاستو موسڵمانبوونی (بەربەرەکان)، بەرەو بارەگاکەی خۆی لە گوندێکی نزیك (قەیرەوان) کە (دکروپ)ی پێ دەوترا گەڕایەوەو، لەوێوە چاودێری جموجۆڵی فەندو فێڵو پلانی ڕۆمەکانی دەکردو، کاری دەکرد دەسەڵاتیان لە باکوری ئەفریقیادا ڕیشەکەن بکات، بەڵام شاشەکەی نەیکردو هێندە لەوێ نەمایەوە، لە ساڵی ٦٢ی کۆچیدا (مسلمەی کوڕی مخلدی ئەنساری)ی والی (مصر)و براگەورەوپشتیوانی بەهێزو قایمی ئەو کۆچی دوایی کرد، کاتێك ئەو پاڵپشتە نەما، یەزیدی کوڕی معاویە (٦٠ـ٦٤ك)، بۆ جاری دووەم (عوقبەی کوڕی نافع)ی بۆ سەر پۆستی ویلایەتی (ئەفریقیا) ناردەوەو (أبو المهاجر)ی لێخست،[1] کاتێك کەسێکی وەك (أبو المهاجر)–ی کۆیلەو ناعەرەب– دەکرێت بە والی (ئەفریقیا)، ئەمە خۆی لە خۆیدا بەڵگەیە لەسەر ئەوە: کە (مسلمەی کوڕی موخەللەدی ئەنساری) متمانەی تەواوی لەسەر هەبووە، هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە لە ئیسلامدا هەڵسوکەوتی جوانو ڕێکوپێك لەگەڵ خەڵکانی کۆیلەو ناعەرەبدا ئەنجام دەدرێتو دەری دەخات کە هەموو خەڵکانی موسڵمان بە عەرەبو تەواوی نەتەوەکانی ترەوە لە ئیماندا یەکسانن، هەروەها ئەمە دەبێتە بەڵگە کەموسڵمانە ناعەرەبەکان لە سەردەمی (ئومەوی)یدا دەستیان بە پۆستە بەرزو باڵاکان گەیشتووەو، درۆی ئەوانەش پوچ دەبێتەوە کە بە پێچەوانەی ئەمەوە قسە دەکەن، وتراوە: کە (أبو المهاجر) لە ناعەرەبەکانی (نەوبە)ی (مصر) بووەو، دەشڵێن: کە ڕەچەڵەکی دەگەڕێتەوە سەر نەتەوەی (بەربەر).[2]

---

١ العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ٢٧٩).

٢ خلافة معاوية للعقيلي (ص: ١٣٠ـ١٣١).

## شەشەم: هێرشی دووەمی (عوقبەی کوڕی نافع) ٦٢، ٦٣ك:

(عوقبەی کوڕی نافع) گەیشتە (ئەفریقیا)و کاروبارەکانی ڕێکخستو، بە توندوتیژی مامەڵەی لەگەڵ (أبو المهاجر) کردو، کوریسێکی توندی لێ ئاڵاندو بەستیەوە،[1] لەگەڵ ئا ئەمەداو هەموو ئەو ڕووداوە ناخۆشانەی لە نێوانیاندا ڕوویاندابوو، (أبو المهاجر) دڵسۆزو مەردو بە ئەمەك بوو، بەوپەڕی دڵاوایییەوە دڵسۆزیو ئامۆژگاریەکانی خۆی پێشکەش بە (عوقبە) دەکردن، یەکێك لەو ئامۆژگاریە هەرە دیارانەی ئەمە بوو: کە بە (عوقبە)ی ڕاگەیاند ڕێز لە (کوسەیلە)ی سەرۆکی (بەربەر) بگرێتو بە خاتر ئەوە درێژە بە موسڵمانبوونەکەی بدات هەوڵ بدا دڵی ڕابگرێت، بەڵام (عوقبە) سوکایەتی بە (کوسەیلە) دەکرد، ڕۆژێك فەرمانی پێکرد کە لەبەر چاوی ئەو مەڕێکی -سەربڕدراو- بگروێ، (کوسەیلە) مەڕەکە دەداتە دەست خزمەتکارێکی خۆی، (عوقبە) تێی ڕاخوڕی کە دەبێ بە دەستی خۆی ئەم کارە بکات، جا (کوسەیلە) بە توڕەییەوە هەستاو دەستی بە کارەکە کرد، هەموو جار لە کاتی سەروبەرکردنی مەڕەکەدا دەستێکی بە سەرو ڕیشی خۆیشیدا دێنا، ئەم هەواڵە بە (أبو المهاجر) گەیشت، ئەویش کەسێکی بۆ لا ناردو ڕێگری ئەم کارەی لێکردو دەیوت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دڵو دەروونی دەسەڵاتبەدەستەکانی عەرەبی ڕادەگرت، کەچی تۆ سوکایەتی بە پیاوێك دەکەی کە لە نێو نەتەوەو وڵاتی خۆیدا دەستی دەڕواتو نۆموسڵمانەو لە ڕۆخی کەندەڵانی شیرکەوە نزیکەو، دەتەوێت دڵو دەروونی تێکدەی وەهەڵی دێری ؟ ،پەیمانی لێ بسێنە چونکە -وەك ماری کلك قرتێنراو- لە هەڵگەڕانەوەیو سەرکەشبونی لێ دەترسێم.[2]

بەڵام (عوقبە) بایەخی -بەم ئامۆژگاریە- نەداو لەسەر سوکایەتی کردنەکەی بە (کوسەیلە) بەردەوام بوو، لەمەولا قسە دێتە سەر پەیمانشکاندنی ئەو، کە چۆن تاکبونەوەی عوقبەی بە تاقمێك لە سوپاکەیەوە بە دەرفەت وەرگرتووەو، ئەوەش ڕوون دەکرێتەوە کە چۆن (عوقبە) بە (أبو المهاجر)ی وت: خۆت بگەیەنە (قەیرەوان)و کاروباری موسڵمانان ڕاپەڕێنە، -لە من گەڕێ- حەزم لە شەهیدبوونە، (أبو المهاجر)یش وتی: منیش وەکو تۆ ئاواتەخوازی شەهیدیم، جا هەردووکیان لەگەڵ تەواوی موسڵمانانی هامڕایان کێلانی

---

١ فتوح مصر (ص: ١٣٤).

٢ قادة فتح المغرب (١١/١٣٧، ١٤٢)، ریاض النفوس (١/٢٦).

شمشێرەکانیان شکاندو هەتا نەکوژران دەستیان لە کوشتار-ی کافران- هەڵنەگرت،[١] پێشدا بینیمان کە چۆن (أبو المهاجر) جەنگێکی گەورەی بەرپاکردو (ڕۆمو بەربەر)ی پێکەوە تێدا بەزاندنو پاشان بەربەرەکان گەردنکەچی بوونو ژمارەیەك لە سەرکردەکانیان -کە (کوسەیلە)- هەرە دیارەکەیان بوو بە خۆیانو زۆرێك لە نەتەوەکەیان هاتنە نێو ئاینی ئیسلامەوەو، بەمە (أبو المهاجر) هەوڵو تەقالاو مەسرەفێکی زۆری بۆ گەڕاپەوەو خۆ ئەگەر ئەم بەربەرانە ئاوا بەبێ باوەڕی بمانایەوە دەبووایە لە فەتحکردنی وڵاتی مەغریبدا، بەختی کردبایە، بێگومان کاتێك (عوقبە) سوکایەتی بەم سەرۆکەی (بەربەر) دەکرد چونکە پێی وانەبوو موسڵمانبوونەکەی بە ڕاستی بێ، دەنا ئەو بەرانبەر بە هەموو موسڵمانێك لە هەر ئاستێکدا بووبن خۆی زۆر بە کەم گرتووە، بە ئیجتیهادی خۆی هەوڵی دەدا بە ڕادەیەك ئەم پیاوە داماو بکات تا جێگەو پێگەیی‌و گەورایەتی‌و سەرکەشیەکەی لە دڵو دەروونی نەتەوەکەیدا ڕیشەکەن بکاتو جارێکی تر نەتوانێت لە دژی موسڵمانان گەلەکۆمەیان پێ بکات، بەڵام لەم ئیجتیهادەیدا نەیپێکا چونکە نەتەوەی ئەم پیاوە تازە بە تازە هاتبوونە نێو ئیسلامەوە، بە هەر حاڵ ئەگەر (عوقبە) گومانیشی لەسەر ڕاستی‌و دروستی دۆستایەتی کوسەیلە -بۆ موسڵمانان- هەبوبێت، ئەوا ڕاکێشانی‌و هێشتنەوەی ئەو لەنێو سوپای ئیسلامو دەسەڵاتەکەیدا زۆر لەوە باشتر بووە کە بخرێتەوە نێو سەنگەری دوژمنایەتی کردنی موسڵمانانەوەو، ئیتر لە کەمینە سامناکەکاندا دەرفەتیان لێ وەربگرێتو گورزی خۆیان لێ بوەشێنێت، ئەمە لە حاڵەتێکدا کە هاوەڵایەتی کردنو شتێك لە متمانەی ئەوانی دەست کەوتبوو.[٢] لەم هەڵوێستەی (عوقبە)دا ئەنجامێکی گرنگی کارکردنو پێڕەوکردن لە ڕێو شوێنو هێڵە ستراتیژیەکانی ئایینی ئیسلاممان بۆ دەردەکەوێت، کە هەرە گرنگەکەیان: کارکردنە بە شوراو وەرگرتنی ڕای ئەهلی (حەلو عەقدە) بە تایبەتی لە کاروبارە گرنگەکاندا، هەرچۆنێك بووبێت، هەر یەکێك لەم دوو سەرکردانە لە هەڵسوکەوتی خۆیدا موجتەهید بووەو، گومان نابرێت کاری بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی یان هۆزەکەی کردبێت، بەڵکو هەردووکیان چاویان لە بەرژەوەندی ئیسلامو موسڵمانان بووە، بەڵام لەم بابەتەدا ئیجتیهادی (أبو المهاجر) لە پێکانەوە نزیکتر بووە.[٣]

---

١ قادة فتح المغرب (١١/١٣٧، ١٤٢)، رياض النفوس (١/٢٦، ٢٧).

٢ التأريخ الاسلامي (١٣/٢٥٤).

٣ المصدر نفسه (١٣/٢٥٤).

**١ـ جیهادکردنی لە (قەیرەوان) تا (زەریا):**

ساڵی ٥٥ کۆچی ودوای دروستکردنی شاری قەیرەوان (عوقبەی کوڕی نافع) لەسەر پۆستی ویلایەتی (ئەفریقیا) دابەزێنرا، پاشان لە ساڵی ٦٢ك هاتەوە سەری‌و دەستی بە بەڕێکردنی کاروانە جیهادیە بەناوبانگەکەی کرد، لە (قەیرەوان)ی (تونس)ەوە بەرەو کەناری زەریای ئەتڵەسیی وڵاتی مەغریب، لەم گەشتەیدا زیاتر لە هەزار میل ڕێگای بڕی، (زوهێری کوڕی قەیسی بەلوی) لە (قەیرەوان)دا کردە جێنشینی خۆی‌و بەم شێوازە بۆ (قەیرەوان) پاڕایەوە: ئەی پەروەردگار –ئەم شارە– پڕ کەی لە زانستو فیقهو گوێڕایەڵو فەرمانبەردارانی خۆت، خودایە بیکەی بە مایەی باڵادەستبوونی دینەکەتو سەرشۆڕی‌و داماوی هەموو ئەوانەی باوەڕت پێ ناهێنن... خودایە لە هێرش‌و پەلاماری زۆردارانی سەر زەوی بیپارێزە،[١] ئەمجا (عوقبە) بە خۆی‌و ئەو دە هەزار کەسەی کە لە (شام)ەوە هێنابوونی‌و خەڵکێکی زۆر کە لە قەیرەوان پەیوەندیان پێوە کردبوو، بۆ غەزا بەڕێکەوت، بەرلەدەرچوونی بانگی ڕۆڵەکانی کردو پێی وتن: من خۆم بە خودای مەزن‌و باڵادەست فرۆشتووەو، درێژە بە جیهاد کردن دەدەم، ئەمجا وتی: ئەی ڕۆڵەکانم سێ ئامۆژگاریتان دەکەم بیانپارێزن‌و لە دەستیان مەدەن، نەکەن سنگی خۆتان پڕکەن لە هۆنراوەو واز لە (قورئان) بهێنن، چونکە قورئان مەشخەڵی بەرەو خواچوونە، دەست بەو پەندە عەرەبیانەوە بگرن کە ڕەوشتە جوانەکانتان فێر دەکەن‌و، مرۆی ژیر بە هۆیانەوە ڕاستەڕێ دەبێ، ئەمجا واز لە ئەوانی تریان بێنن، تکاتان لێ دەکەم خۆ لە قەرزداری بپارێزن، ئەگەر ناچار بن کراسێکی ئاودامانیش لەبەر بکەن قەرز مەکەن، چونکە قەرزداری بە ڕۆژ داماویەو بە شەو خەم‌و پەژارەیە، خۆتانی لێ دوور بخەنەوە، بەمە چارەنوس‌و کەسایەتی‌و ناموس‌و سامانتان دەپارێزن‌و، هەتا لە ژیاندا بن ڕێزو حورمەتتان لە لای خەڵك دەمێنێت، زانست لە خەڵکانی لوتبەرزی بەفیزی خۆبەزلزان وەرمەگرن،دەنا لە بەرانبەر دینی خودادا بێئاگاتان دەکەن‌و نێوانتان لەگەڵ خودا تێك دەدەن، دینەکەتان لە خەڵکانی خۆپارێزو حەڵاڵخۆر وەربگرن، ئەمە ڕێگەی ساغ‌و سەلامەتیتانە، هەر کەسێك ئیحتیات بکات دەچێتە ڕیزی ڕزگارانەوەو ساغ‌و سەلامەت دەبێ، ئەمجا وتی: سەلامی خواتان لێ بێت، پێم وایە لە ئەمڕۆ بە دواوە ئێوە من نابیننەوە، ئەمجا وتی: خودایە بمخە بازنەی ڕەزامەندی خۆتەوە، ئەم جیهادەم بۆ

---

١ البيان المغرب (٢٣/١)، الاسلام والتعريب في الشمال الافريقي (١٢٦/١).

بكەی بە مایەی ڕەحمەت‌و خانەی ڕێزگیرانم لە لای خۆت.[١] بەم ڕەنگە هێشتا (عوقبە) لە (قەیرەوان) جێ پێیەكانی گەرم دانەهاتبوون، بەبێ ترس‌و دوودڵی بڕیاری دا بۆ جیهاد دەرچێ، ئەو لە میانەی ئامۆژگاریەكەیدا بۆ كوڕەكانی كەوتی: (من خۆم بە خودا فرۆشتووەو درێژە بە جیهادكردن دەدەم) دەریخست كە چەندە بە هیممەت‌و چەندە تامەزرۆی جیهادە، ئەو لە ڕاستیدا خۆی بە خودای بالادەست‌و مەزن فرۆشتبوو، حەزی لە پاداشتە بە نرخ‌و گرانبەهایەكە بوو: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَۚ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقۡتُلُونَ وَيُقۡتَلُونَۖ وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقّٗا فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ وَٱلۡقُرۡءَانِۚ وَمَنۡ أَوۡفَىٰ بِعَهۡدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِۚ فَٱسۡتَبۡشِرُواْ بِبَيۡعِكُمُ ٱلَّذِي بَايَعۡتُم بِهِۦۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ١١١﴾[٢] واتە: خودا لە بەرانبەر پێدانی بەهەشتدا گیان‌و ژیان‌و سامانی لە ئیمانداران كڕیوە، بەم چەشنە لە ڕێی خودادا جەنگ دەكەن‌و دەكوژن‌و دەكوژرێن، ئەمە بەڵێنی ڕاست‌و دروستی خودایە (بۆ ئەوان) كە لە (تەورات‌و ئینجیل‌و قورئاندا) هاتووە، (ئاخر) كێ هەیە لە جێبەجێكردنی بەڵێنیدا لە خودا وەفادارتر بێت؟! جا مژدەی ئەو مامەڵەیەتان وەربگرن كە لەگەڵ خودادا كردووتانە، ئا ئەمە بردنەوەی هەرە مەزنە.

ئیتر (عوقبە) ژیان‌و گیانی خۆی نەذری خوداكردن‌و دەستی بە جیهاد كردو، ئامانجە بەرزەكەی لەبەر هەردووك چاوی خۆی دانا كە بریتیە لە بەرزكردنەوەی وشەی (الله) لەسەر زەویدا،[٣] سودێكی گەورە لەم وەسیَتەدا وەردەگیرێت، سێ وەسێتی بۆ كردن:

أـ یەكەم وەسێت: بایەخدان بە پاڵفتەكردنی زانست‌و هەڵبژاردنی هەرە پاك‌و پوختەكەی، یەكەمین جار دەبێ بایەخ بە قورئانی پیرۆز بدەن: چونكە نیشانەیە لەسەر خودای مەزن‌و دەسەلاتدار، تەماشا چەند وەسفێكی جوانە! چونكە قورئان مەشخەڵی ڕێی گەیشتنە بە ڕەزامەندی خوداو نازو نیعمەتە نەبڕاوەكانی -كە ئامانجی سەرەكی هەموو ئیماندارێكە-، بێگومان سوننەتی پێغەمبەری خوداش (ﷺ) دەچێتە بازنەی مەبەستەكانی قورئانی پیرۆزەوە، خودای بەرز دەفەرمووێت: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ﴾[٤] واتە: هەر شتێك پێغەمبەر پێی بەخشین‌و فەرمانی وەرگرتنی

---

١ البيان المغرب (١/٢٣)، صفحات من تأريخ الليبا والشمال الأفريقي (ص: ٢٤٨).

٢ التوبة (١١١).

٣ التأريخ الاسلامي (١٣/٢٥٧).

٤ الحشر (٧).

پێ کردن، وەری بگرن هەر شتێکیش ئەو ڕێگری لێ کرد، وازی لێ بهێنن‌و دەستبەرداری بن، ئەمجا -دێتەسەر- هەڵبژاردنی وشەو ڕستە پاك‌و پوختەکانی عەرەب کە ئاوەزی ساغ ڕێنمایی دەکەن‌و مرۆڤ بەرەو ڕەوشتە جوانەکان هەڵدەنێن.

ب- دووەم وەسێت: خۆدوورگرتن لە قەرزکردن -ئەگەرچی هەژاریش تین بێنێت- چونکە قەرزاری بریتیە لە داماوی لە ڕۆژدا، بە جۆرێك قەرزدار وادار دەکات لە ئاست خاوەن قەرزو هەموو ئەوانەی پەیوەندیان پێیەوە هەیە هەندێك هەڵوێستی داماوانە بنوێنێت، هەروەها بریتیە لە خەم‌و خەفەت لە شەودا، بە جۆرێك بابای قەرزدار لەگەڵ خۆی تاك دەبێتەوەو خەوی لێ دەزڕێت‌و بیر لەوە دەکاتەوە کە مافی خەڵکی بە سەرەوەیە.

ج- سێهەم وەسێت: گەڕان بە دوای چۆنیەتی وەرگرتنی زانست: بە هەڵبژاردن‌و دیاریکردنی زانایانی خوداناس‌و لەخواترس‌و خۆپارێزو حەلاڵخۆرو، خودوورخستنەوە لە زانایانی دنیاپەرست‌و پلەوپایە دۆست‌و سەرکەش‌و لوتبەرز، چونکە نەفامی‌و نەزانی بۆ فێرخواز زیاد دەکەن‌و بە جۆرێك دەبنە مایەی دورخستنەوەی لە کاکڵەو بەرهەم‌و بەروبومەکەی زانست کە بریتیە لە تەقوای خودای گەورەو مەزن،[1] دەبینین (عوقبە) لە کۆتایی وەسێتەکەیدا: خواحافیزەی لە دنیادەرچوون لە ڕۆڵەکانی دەکات، کە بەڵگەیە لەسەر ئەوە بەم زووانە لە ڕێی خودادا شەهید دەبێ، ئەمجا دەڵێت: خودایە گیانم بۆ ڕەزامەندی خۆت لێ قبولْ بفەرموو، جیهاد بکەی بە مایەی ڕەحمەت‌و بەزەیی هاتنەوەت بە منداو، ماڵی ڕێزگرتنم بە لای خۆتەوە.[2] ئەمەو (عوقبەی کوڕی نافع) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بە هۆی ئەم بایەخپێدانە گەورەو گرانەیەوە بە جۆرێك جیهادی کردبووە بابەتی هەرە گەورەی لەم ژیانەدا لە فتوحاتەکانیدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا،[3] (عوقبە) بە خۆی‌و سوپایەکی گەورەوە بەرەو شاری (باغیە) بەڕێکەوت،[4] لە لایەن بێزەنتیەکانەوە -کە پاشان بەزین‌و چونە نێو شارەکەوەو خۆیان تێدا مەڵاسدا- تووشی ڕووبەڕووبوونەوەیەکی توند بۆوە، ماوەیەك گەمارۆیدان‌و، ئەمجا بەرەو (تەلمەسان) بەڕێکەوت - کە بە گەورەترین شار دادەنرا-، هەرچی ڕۆم‌و بەربەری دەوروبەری هەبوون پەیوەندیان بە شارەکەوە کردو، بە

١ صفحات من تأريخ الليبا والشمال الأفريقي (ص: ٢٥٩).
٢ البيان المغرب (٢٣/١).
٣ التأريخ الاسلامي (٢٥٨/١٣
٤ مصر في العصر الأموي (ص: ١٢٣)، الكامل في التأريخ (٥٨٩/٢).

سوپایەکی گەورەوە بۆ بەرەنگاربوونەوەی (عوقبە)و سوپاکەی دەرچوون، چەخماخەی جەنگ لێدراو شەڕو پێکدادان دەستی پێکرد، هەردوولا ئارامیان گرت‌و پێیان لە گۆڕەپانی جەنگ چەسپاندن، کاربەوە گەیشت موسڵمانەکان گومانیان برد کە لەم جەنگەدا لەنێو دەچن‌و کەسیان لێ دەرناچێت، بەڵام خودا ئاوری بەخێری لێدانەوەو خۆڕاگری‌و چەسپاوی‌و گەرم‌و گوڕی زیاتری پێ بەخشین‌و، ئیدی وێکڕا هێرشێکی توندو خەست‌و خۆڵیان کردە سەر ڕۆمەکان‌و ناچاریان کردن هەڵێن‌و پەنا بۆ قەڵاو شورەکانیان بەرن، ئیتر پێشدەرگایان پێگرتن‌و خەڵکێکی زۆریان لێ کوشتن‌و سەروەت‌و سامانێکی زۆریشیان لێ تالان کردن،[1] ئەمجا بە مەبەستی وڵاتی (زاب) بەرەو خۆرئاوا بەڕێکەوت، پرسیاری کرد کە گەورەترین شاریان کامەیە؟ پێی وترا: (ئەربە) پایتەختیەتی، سێ سەدو شەست گوندی بە دەورەوە بوون‌و هەموویان ئاوەدان بوون، ڕۆمەکانی ناو شارو ئەوانەی لەوێ بوون خۆیان تێدا قایم کردو، هەندێکیشیان بەرەو چیاکان هەڵاتن، موسڵمانەکان جەنگیان لەگەڵ خەڵکی شار کردو، لە ئەنجامدا تێکیان شکاندن‌و زۆرێك لە ئەسپسوارەکانیان لێ کوشتن، ئەمجا (عوقبە) بەرەو (تاهرت) بەڕێکەوت، ڕۆمەکان هاواریان لە بەربەرەکان بەست، ئەوانیش بە دەنگیانەوە چوون‌و پشتیوانیان لێکردن، (عوقبەی کوڕی نافع) وتارێکی بۆ سوپاکەیداو، پاش سوپاس‌و ستایشکردنی خودا، وتی: ئەی خەڵکینە پایەبەرزترین‌و باشترین کەستان ئەوانە بوون کە خودا لێیان ڕازی بوو، کتێبی خۆی بۆ نێو ئەوان دابەزاند، پەیمانی ڕەزامەندیان بە پێغەمبەری خودا دا لە دژی هەر کەسێك لە دژی خودا ڕادەوەستێ، ئەوان پیاوماقوڵانی پلەیەکی ئێوە بوون، پێشەنگ‌و پێشینەی ئێوە بوون بۆ پەیماندان، مامەڵەیان لەگەڵ پەروەردگاریان کردو لە بەرانبەر پێدانی بەهەشتدا خۆیان بە خودا فرۆشت، ئیمڕۆ ئێوە لە وڵاتی غەریبی دان‌و تەنها بەیعەتتان بە پەروەردگارتان داوە، لەم شوێنەی خۆتان چاوی لێتانە، -چاك دەزانێ- کە تەنها بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەوو باڵادەستکردن‌و بەهێزکردنی دینەکەی ئەوزاتە خۆتان گەیاندۆتە ئەم وڵاتە، جا موژدەتان لێ بێت، هەر کاتێك دوژمن -بە ژمارە- زۆر بوو -بە ویستی خوا- زیاتر سەرشۆڕو داماو دەبێت، دڵنیا بن کە پەروەردگارتان بە دەستەوەتان نادا، کەواتە بە دڵ‌و دەروونێکی ساف‌و ڕاست‌و دروستەوە پێیان هەڵشاخێن، چونکە خودای گەورەو مەزن ئێوەی کردووە بەو گورزەی کە ناکرێ‌و نابێ

---

١ البيان المغرب (١/٢٣، ٢٧)، التأريخ الاسلامي (١٣/٢٦١).

لە خەڵکانی تاوانباری نەوەشێنی، جا لەسەر بەرەکەت‌و کۆمەکی خودا بچنە گۆڕەپانی جەنگی دوژمنەکەتانەوە، خودا بڕیاری وەشاندنی گورزی سزای خۆی لە بەرانبەر خەڵکانی تاوانباردا هەڵناوەشێنێتەوە.[1] ئەمە وتارێکی بە پێزو مەزنەو بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە (عوقبەی کوڕی نافیع) (ڕەزای خوای لێ بێت) لە جەنگەکانیدا پشتی بە چەکی هەرە گەورە بەستووە کە ڕازی هەموو سەرکەوتنە مەزنە یەك لە دوای یەکەکانی موسڵمانانی لەخۆ گرتووە، کە بریتیە لە چەکی پشتبەستن بە خودای بەرزو مەزن‌و، بە بەرچاوی خۆداهێنانی گەورەیی‌و دەسەڵاتەکەی‌و، لەگەڵبوون‌و پشتگیریکردن‌و سەرخستنی لە دۆستانی ئیمانداریەتی لە هەموو کات‌و شوێنێکدا، ئیتر ئەو گوێ بە سوپای دوژمنانی نادا ئەگەرچی زۆریش بێ، بەڵکو ئەو تەنها بایەخ بەوە دەدات کە بە چاکی لەوە دڵنیا بێت ئەم چەکە کاریگەرە لەنێو سوپاکەیدا بوونی باشی هەبێت، ئیتر هەر کاتێك ئەمە دابین کرا، ئەویش لەو کاتەدا پێشوازی لە گەلەکۆمەی سوپای دوژمنەکانی دەکات، تا بە خێرایی لەسەر دەستی دۆستە چاك‌و پاکەکانی خودا لە نێو بچن‌و پەرتەوازە ببن، تەماشای (عوقبە) بکە کە لە هەڵسوکەوتەکانیدا چەندە بە (خالیدی کوڕی وەلید) دەچێ، کاتێك (خالید) زۆری‌و قەبەیی‌و چەندرەگەزی سوپای دوژمنەکانی چاو پێ دەکەوت، بەبێ لەخۆگۆڕان‌و بە کەمدانان‌و بە چاوی سوك تەماشاکردن، خۆشی‌و شادی سەرتاپا دڵ‌و دەروونی دادەگرت‌و هەستی بە هێزو مەزنایەتی دەکرد، (عوقبە) بە شوێن هەنگاوەکانی ئەودا دەڕۆیشت‌و لە سەرکردایەتیکردن‌و هەنگاو هەڵێنانێکدا کە نە دڕدۆنگی دەناسێت‌و نە حیساب بۆ شەکەتبوون دەکات ئەوی کردبوو بە پێشەنگی خۆی، ئەو لە هەنگاوهەڵێنان‌و بەرەو پێشچونیدا چاك دەرکی بەوە کردبوو کە سەربازە ڕاستگۆکانی ئیسلام گورزی سزای خودای باڵادەستن بۆ سەر دوژمنە بێباوەڕەکانی، سزای خودای باڵادەستیش لە بەرانبەر تاوانباراندا هیچ شتێك نیە بیگێڕێتەوە، هەستی هەمیشەی ئەو کە موجاهیدانی ئیسلام شمشێری خودای بەرزو بە دەسەڵاتن‌و گورزی سزای ئاراستەکراوی ئەون بە ڕووی دوژمنانیدا وای لێ دەکرد گومانی باشی بە پەروەردگاری هەبێت‌و متمانەی تەواوی لەسەر سەرکەوتنە چاوەڕوانکراوەکەی ئەو هەبێت،[2] بەڵێ: سوپای ئیسلام لە شاری (تاهرت) بە دوژمن گەیشت‌و جەنگێکی گەرم‌و

---

١ البيان المغرب (١/٢٣، ٢٧)، قادة الفتح المغرب العربي (١/١٠٨، ١٢٠).

٢ التأريخ الاسلامي (١٣/٢٦٠).

توندوتیژی لەگەڵ کرد، موسڵمانەکان بە هۆی زۆری ژمارەی دوژمنەکانیانەوە تینیان بۆ هات، بەڵام لە کۆتاییدا سەرکەوتن‌و، ڕۆم‌و بەربەرە دوژمنەکانیان بەزین‌و، ژمارەیەکی زۆریان لێ کوژران‌و موسڵمانەکان سامان‌و چەکێکی زۆریان لێ گرتن،[1] ئەمجا (عوقبە) بەرەو مەغریبی سەرو بەڕێکەوت‌و گەیشتە (تەنجە)، لەوێ ڕووبەڕووی بتریقێکی ڕۆمی بە ناوی (جولیان) بۆوە، (جولیان) دیاریەکی نایابی پێشکەش کردو لەسەر حوکمی ئەو دابەزی،[2] کاتێك (عوقبە) سەبارەت بە دەریای(ئەندەلوس) پرسیاری لێکرد، وەڵامی دایەوەو وتی: نا، دەریایەکی پارێزراوەو پەرژی نەشکێنراوەو ناشکێنرێت،[3] ئەمجا بەم دەربڕینە سەبارەت بە بەربەرو ڕۆم پرسیاری لێکرد: ڕێنمایم بکە بۆ سەر پیاوانی بەربەرو ڕۆم، وتی: ڕۆمەکانت لە پشت خۆتەوە بەجی هێشتن‌و جگە لە بەربەرو ئەسپسوارەکانیان کەسی ترت بەرەو ڕوو نەماوە کە جگە لە خودا کەس ژمارەیان نازانێت‌و بریتین لە کەسە هەرە بەهێزو دەست وەشێن‌و ئەسپسوارەکانی بەربەر، (عوقبە) وتی: شوێنەکەیان کوێیە؟ وتی: سوسی خواروو، ئەوان گەلێکن دینیان نیە،[4] (عوقبە) کەڵکی لەم زانیاریانە وەرگرت‌و بەرەو باشوری خۆرئاواو بە ئامانجی گەیشتن بە وڵاتی (سوسی خواروو) بەڕێکەوت، لەوێ لەگەڵ چەند تاقمەیەکی بەربەری ئەتڵەسی نێوەڕاست تێکگیرا، تێکی شکاندن‌و دەری کردن‌و بەرەو بیابانی دۆڵی (دەرعا) ڕاوەدووی نان، لە شاری دەرعا، مزگەوتێکی دروست کرد، ئەمجا بیابانی (مەراکیش)ی بەجێ هێشت‌و بە خاتری سوڕانەوە بە دەوری چیای ئەتڵەسی سەروداو چوونە نێو وڵاتی (صنهاجە)وە، بە ئاراستەی باکوری خۆرئاواو بەرەو ناوچەی (تافللت) بەڕێکەوت، دانیشتوانی (صنهاجە) بەبێ جەنگ هاتنە ژێر فەرمانیەوە، هەروەها هۆزەکانی (هکسورە)ش لە شاری (ئەغمات) ئەم کارەیان کرد، پاشان (عوقبە) لە خۆرئاوا بەرەو شاری (تفیس) بەڕێکەوت،[5] تەماشای کرد خەڵکانێکی بێزەنتی‌و بەربەر خۆیان تێدا مەڵاس داوە، بەڵام ئەمە دادی نەدان‌و، بەسەرکەوتوویی چووە نێو شارەوە، بەم جۆرە فەتحکردنی وڵاتی (سوسی سەرو) تەواو بوو، چووە نێو (ئیجلی) پایتەختیەوەو مزگەوتێکی

---

١ الكامل في التأريخ (٢/٥٩٠).

٢ المصدر نفسه (٢/٥٩٠).

٣ المصدر نفسه (٢/٥٩٠)، مصر في العصر الأموي (ص: ١٢٥).

٤ الكامل في التأريخ (٢/٥٩٠)، مصر في العصر الأموي (ص: ١٢٥).

٥ مصر في العصر الأموي (ص: ١٢٦)، البيان المغرب (١/٢٦، ٢٧).

تێدا دروست کرد، ئەمجا هۆزەکانی ئەوێی بەرەو ئیسلام بوون بانگهێشت کردو، تیرەکانی (جزوله) بە دەم بانکەوازەکەیەوە هاتن‌و موسڵمان بوون، پاشان بەرەو شاری (ماسه)و لەوێشەوە بەرەو (رأس إيفران)ی سەر کەناری زەریا چوو،[1] ئەمەو (عوقبەی کوڕی نافیع) گەیشتە سەر کەناری زەریای ئەتڵەسی، تا ئەو کاتەش زۆربەی زۆری وڵاتی (مەغریب)ی فەتح کرد، سەرچاوە مێژووییەکانمان ئاماژە دەدەن: کە کاتێك (عوقبە) گەیشتە قەراغ زەریای ئەتلەسی، وتی: ئەی پەروەردگار، ئەگەر ئەم زەریایە نەدەبوو هەر دەڕۆیشتم‌و لە رێی تۆدا جیهادم دەکرد، ئەمجا وتی: خودایە بە شایەد بە کە ئەوپەڕی هەوڵ‌و تەقالای خۆم بەخت کرد، ئەگەر ئەم زەریایە نەدەبوو، بە وڵاتاندا دەڕۆیشتم‌و، جەنگم لەگەڵ بێباوەڕان‌و دوژمنانی خودا دەکرد، ئیدی بەردەوام دەبووم تا ئەوەی جگە لە تۆ کەسی تر نەدەپەرسترا، کەمێك وەستاو پاشان بە هاوڕێکانی وت: دەستتان بەرز بکەنەوە، ئەوانیش دەستیان بەرزکردەوە، جا وتی: خودایە نە بە فیزودەعیەوە دەرچووم نە بە لوتبەرزی‌و خۆ پێ زلی، بۆ خۆت چاك دەزانی کە ئێمە ئەو ئامانجەمان دەوێ کە (ذوالقرنين)ی بەندەت داوای دەکرد، کە بریتیە لەوەی بپەرسترێیت‌و شەریکت بۆ پەیدا نەکرێت، خودایە ئێمە بەرهەڵستی بێباوەڕی دەکەین‌و بەرگریش لە دینی ئیسلام دەکەین، سا ئەی خودای گەورەو بەخشندە تکا دەکەم بۆمان بەو لە دژمان مەبە، ئەمجا ئاوڕی دایەوەو بە شوێنی خۆیدا گەڕایەوە.[2] لەم وتانەیدا دیارە: کە چەندە جیهادی پێ خۆش بووەو، هەستی بەو بەرپرسیاریەتە گەورە کردووە کە لە ئەستۆی خۆی گرتووەو، کە بریتیە لە گەیاندنی ئیسلام‌و بەهێزکردنی دەوڵەتەکەی‌و ڕاماڵینی ئەو دەوڵەتە کافرانەی بوونەتە پەرچی گەورەی ڕێی گەیشتنی ڕووناکایی ئیسلام بە گەلەکانیان، ئەو لە قەراغ زەریا ڕادەوەستێت‌و، لەو کاتەدا دەزانێت کە ئەوێ لە وڵاتی (مەغریب)دا دواخاڵی ئاوەدانی سەر زەویە، ئەمجا دەبینین: کە خودای بەرزو مەزن دەکا بە شایەد، لەسەر ئەوە هەموو ئەو هەوڵ‌و کۆششانەی خۆی بەخت کردن کە لە بازنەی توانای ئەودا بوون، ئەم خودا بە شایەدگرتنەی پێمان دەڵێ: کە ئەو پەیوەندیەکی باشی لەگەڵ خودای بەرز هەبووەو، هەتا سەرکەوتن‌و ڕەزامەندی لە خودا نەخواستبێت هەنگاوێکی هەڵنەهێناوە، ئەم وتەیە بەڵگەیە کە ئامانجی

---

١ الكامل في التأريخ (٢/٥٩٠).

٢ الكامل في التأريخ (٢/٥٩٠)، البيان المغرب (١/٢٣، ٢٧)، قادة فتح المغرب العربي (١/١٠٨، ١٢٠).

جیهاد لە لای (عوقبە) ڕوونو ئاشکرایەو، بە جۆرێك دەری خست کە جیهادکردن تەنها لەم سنوورەدا دەوەستێ: کاتێك شیرکو بتپەرستی لەسەر زەوی نامێنێت، جگە لە (ألله) هیچ شتێکی تر ناپەرسترێت، کەواتە هەتا شیرکو بتپەرستی لە ئارادا بێت، ئەوا دەبێت جیهادیش هەبێت، کەواتە (جیهاد) بریتیە لە جیهادی بانگەوازیو خەڵك بانگهێشتکردن بۆ لای خودای بەرزو مەزن، لە ڕێی ڕامالّینی ملهوڕی مرۆییو گەردنکەچکردنی دەولّەتانی جیهان لە ئاقار حوکمی ئیسلام، لە پێناو ئەوەدا تێگەیشتن لە ئیسلامو پەیڕەولێکردنی بۆ هەر هەموو خەڵك ئاسان ببێ،[1] کارو چالاکیەکانی (عوقبە) هەر لە سنووری (جیهاد)دا نەدەخولانەوە، بەڵکو شانبەشانی چالاکیە جیهادیەکانی مزگەوتیشی دروست دەکردن، وێنەی: مزگەوتی (دەرعە)و مزگەوتی (ماسە) لە (سوسی سەرو)،[2] هەروەها ژمارەیەك هاوڕێی (زانای) خۆی –لە شارو دێهاتەکاندا– بەجێ دەهێشتنو خەڵکیان فێری قورئانو شەرعو ئادابەکانی ئیسلام دەکرد، (شاکر) یەکێك بوو لەو هاوڕێیانەیو لە نێوان هەردوك شاری (مەڕاکیش)و (موجادور)دا (رباط)ێکی دروست کرد، شوێنەوارەکەی تا ئەمڕۆش ماوەو بە لای دانیشتوانی مەغریبی سەرو بە (سەییدی شاکر) ناسراوە،[3] وەك دەردەکەوێت زۆربەی بەرپەڕەکانی مەغریبی سەروی وەك دانیشتوانی (سنهاجەو هسکورەو جزولە) بە خۆشی خۆیان لەسەر دەستی ئەو موسڵمان بوون،[4] هەروەها هۆزی (مصامدە)ی گەردنکەچ کردو واداری کردن بێنە ژێر فەرمانی ئیسلام،[5] بە خاتری دڵنیابوونی لە هەڵنەگەڕانەوەی هەموو ئەو تیرەو هۆزە زۆرانە دوو شتی ئەنجامدان: یەکەم ژمارەیەك بارمتەی لێ دەگرتن، دووەم: کەسێکی لەنێو خۆیاندا دیاری دەکردو دەیکرد بە سەرۆکیان، بۆ وێنە ئەم سیاسەتەی لە بەرانبەر تیرەی (مصمودە) جێبەجێ کردو یەکێك لە سەرۆکەکانی خۆی بە ناوی (أبو مدرك زرعة کوڕی أبي مدرك)ی بە سەرەوە دانانو، پاشان (أبو مدرك) لە فەتحکردنی (ئەندەلوس)دا بەشداری کرد،[6] تێبینی دەکرێ: کە بتپەرستی بەسەر زۆرینەی بەرپەڕی مەغریبی سەروودا زاڵ ببوو، زۆری کۆیلەو

---

١ التأريخ الاسلامي (١٣/٢٦٢).

٢ رياض النفوس (١/٢٦)، الاسلام والتعريب (١/١٣٣).

٣ البيان المغرب (١/٢٧).

٤ الاسلام والتعريب في الشمال الأفريقي (١/١٣٣).

٥ تأريخ إبن خلدون (٦/١٠٨).

٦ فتوح مصر (ص: ٢٠٧)، الاسلام والتعريب (١/١٣٤).

دەستکەوتەکان ئەمە دەردەخەن، (عوقبە) لەم هەڵمەتانەیدا کەنیزەکگەلێکی وای دەستکەوتن، کە خەڵك وێنەی ئەمانەی نەبینیبوون، دەوترێ: هەر یەکێك لەم کەنیزەکانە لە خۆرهەڵاتدا بە هەزار مسقال بەڵکو زیاتریش بەرانبەر بوو،[١] بە حوکمی زۆریان‌و ئاوێتەبوونیان لەگەڵ ژینگەی عەرەبی ئیسلامی کۆیلەکان بوون بە یەکێك لە هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی ئیسلام لەنێو نەتەوەی (بەربەر)دا، وێڕای ئەمەش هەر لە سەرەتاوە بەریەککەوتن‌و تێکەڵاوی بەردەوامی جەنگاوەرانی عەرەب‌و بەربەر جۆرە پەیوەندیەکی وای لەنێواندا دروستکردن کە لە پەیمانبەستن‌ودۆستایەتیدا ڕەنگی دەدایەوە.[٢] (السلاوي) دەڵێت: کاتێك (عوقبە) گەیشتە چیای (درن) تیرەی (زەنانە) ڕاپەڕی‌وهاتە ڕیزی سوپای ئیسلامەوە، ئەو لەو سەردەمەوە تیرەی(مغراوە) موسڵمان ببوو، خۆی بۆ ئیسلام ساغ کردبۆوە،[٣] ئەمە ئاماژە دەدا کە هەردوك تیرەی (زەنانە)و (مغراوە) لە مێژە موسڵمان بوون‌و، بوونە هاوپەیمانیان‌و ڕاپەڕیون تا بەرگری لە ئیسلام بکەن.[٤]

**٢ـ شەهیدبوونی (عوقبەی کوڕی نافیع)و (أبو المهاجر) ڕەحمەتی خوایان لێ بێت:**

دیارە (عوقبە)ی موجاهیدو دڵساف وەك ئیمانداریکی ڕاست‌و ڕاستگۆ، هەستی بەوە کردووە کە لەمەولاو لە میانەی ئەم گەشتە جیهادیەیدا بە شەهیدی دەگاتەوە بە پەروەردگاری، کاتێك بڕیاری دا لە قەیرەوان دەربچێت‌و دەست بە غەزا بکات، بانگی ڕۆڵەکانی کردو پێی وتن: من گیانی خۆم بە خودای مەزن‌و بەدەسەڵات فرۆشتووە،..... تا ئەوەی وتی: نازانم لەمڕۆ بە دواوە چاوتان بە من دەکەوێتەوە یان نا، چونکە هیوام وایە لە ڕێگەی خودادا بمرم، ئیتر وەسێتی چاکی بۆ کردن‌و ئەمجا وتی: سەلامی خوداتان لەسەر بێت....... خودایە بۆ ڕەزای خۆت گیانم لێ قبوڵ بفەرموو،[٥] (عوقبە) سەرەخۆشی مەرگی خۆی لە ڕۆڵەکانی کردو، خوداش لێی قبوڵ کردو، ئاواتی شەهیدبوونەکەی بۆ جێبەجێ کرد، ڕۆم‌و بەربەر لە لای (تهوذە)[٦] بۆسەیەکیان بۆ داناو، بە خۆی‌و سەربازەکانی کەوتە ناویەوەو لەنێوبران.

---

١ ریاض النفوس (١/٢٤).

٢ الاسلام والتعريب في الشمال الأفريقي (١/١٣٤).

٣ المصدر نفسه (١/١٣٥).

٤ المصدر نفسه (١/١٣٥).

٥ البيان المغرب (١/٢٣، ٢٤).

٦ (تهوذە): ناوی تیرەیەکی (بەربەر)ەو لە ئەفریقیادا هەرێمێکی تایبەت بە خۆیان هەیە.

سەرچاوە مێژووییەکان ڕوودانی ئەم کارەساتە بۆ هۆکارێکی سەرەکی دەگێڕنەوە کە بریتیە: لە سیاسەتی خودی (عوقبە) لە بەرانبەر بەرپەرچ بە شێوەیەکی گشتی‌و (کوسەیلە)ی سەرۆکیان بە شێوەیەکی تایبەت، کە لەنێو هۆزەکەیدا پایەدارو دەستڕۆیشتوو بوو، پێشتر (أبو المهاجر) چاکەی لەگەڵ کردبوو دڵی ڕاگرتبوو، جا موسڵمان بوو زۆرینەی هۆزەکەی شوێنی کەوت، بەڵام (عوقبە) زۆر بە خراپی لە بەرانبەر ئەم پیاوەدا جوڵایەوەو، (أبو المهاجر)یش بە حاڵی خۆی دەرکی بە ئەنجامی ئەو هەڵەیە کرد کە (عوقبە) تێی کەوتبوو، بۆیە لەگەڵ ئەوەشدا دەستبەسەرو بەند بوو، بەڵام خۆی پێ ڕانەگیراو سەبارەت بە ئەمە دڵسۆزانە ئامۆژگاری (عوقبە)ی کرد، بەڵام (عوقبە) گوێی لێ ڕانەگرت‌و بایەخی بەقسەکانی نەدا، (أبوالمهاجر) لە میانەی تێکەڵاوبوونی لەگەڵ بەرپەرو سەرۆکەکەیاندا، زانیبووی کە چەندە شانازی بە سەربەستی‌و ڕێزو حورمەتی خۆیان دەکەن‌و، ئەم سوکایەتیەو داماویەیان پێ قبوڵ ناکرێت کە بەسەر سەرۆکەکەیاندا دەهێنرێت، بۆیە ترسا پەیمان بشکێنن‌و تۆڵەی خۆیان لە (عوقبە) بکەنەوە، جا ئاماژەی بۆ (عوقبە) کرد کە خۆ لە (کوسەیلە) ڕزگار بکات‌و پێی وت: پێش ئەوەی ئەو کاری خۆی بکا لە کۆڵی بکەوە،[1] ئەمجارەش (عوقبە) گوێی لە ئامۆژگاریەکەی (أبوالمهاجر) ڕانەگرت، –خۆزگە ئیحتیاتێکی لەمەدا کردبایە–، بەڵکو هەنگاوی بۆ ئەنجامدانی کارێکی تر هەڵێنا کە لەوپەڕی مەترسیدا دابوو، بەم چەشنە: دوای ئەوە لە گەشتە درێژەکەی مەغریبی سەرووەوە بەرەو (قەیرەوان) دەگەڕایەوە زۆربەی زۆری سوپاکەی خستبووە پێش خۆیەوەو خۆیشی لە دوایەوە دەڕۆیشت، هەر کە لە (قەیرەوان) نزیك بۆوە زۆربەی سوپاکەی پۆل پۆل بۆ نێو شار بەڕێکردەوەو، خۆیشی دوای ئەوان لەگەڵ پۆلە سوپایەکیدا کە خۆی لە سێ سەد هاوەڵ‌و تابیعی ئەسپسوار دەدا بەڕێکەوت، (عوقبە) بەپێی دابی خۆی لە کاتی جەنگدا لە پێشەوەی سوپادا بوو، کاتێکیش سوپا دەگەڕایەوە لە دوایەوە دەڕۆیشت، ئەو بەم نەریتەی هەمیشە خۆی دەخستە نێو مەترسیەوە، هەر ئەم فیداکاری‌و خۆبەخشینەی وای لێکردبوو بە لای تاك تاکی سەربازانی سوپاکەیەوە خۆشەویست بێت، بە چەشنێك سەرپێچی هیچ فەرمانێکی ئەویان نەدەکردو، شوێن پێی

---

١ الكامل في التأريخ (٢/٥٩١).

ئەویان هەڵدەگرت و لە گیانفیداکرندا پێشبڕکەیان دەکرد، بێگومان ئەم سیفەتە بە گرنگترین هۆکاری سەرکەوتنی سەرکردە دادەنرێت لە بواری هەر چالاکیەکدا ڕووی تێ بکات، کاتێك ڕۆمەکان زانیان (عوقبە) بەم ژمارە کەمەوە لە سوپاکەی تاك بۆتەوە، بە هەلیان زانی لەنێوی بەرن،–ئەمە لە حاڵێکدا دەرکیان بەوە کردبوو کە هەبوون و مانی کەسایەتیەکی ئەوا بەهێز بە گرنگترین هۆکاری یەکپارچەیی موسڵمانان و مانەوەی هێز و پێزیان دادەنرێت–، جا ڕۆمەکان لەگەڵ (کوسەیلە)ی بەربەری پیلانیان لەو گێڕاو گەلەکۆمەیان لێکردو، خەڵکێکی هێندە زۆریان بەسەر گێڕا بە چەشنێك نەتوانن دەرەقەتیان بێن،[1] (کوسەیلە) بەهێزێکی بەنجا هەزاریەوە گەمارۆی سوپاکەی عوقبەی داو،[2] (أبو المهاجر)یش بە کۆت و زنجیرکراوی لەگەڵ (عوقبە)دا بوو، کاتێك ڕەشەسوپای دوژمنی بینی ئەم چەند دێڕە بەیتەی (أبو محن الثقفي) دەخوێندنەوە:

کفى حزناً أن تمرغ الخيل بالقنا

وأترك مشدوداً عليَّ وثاقيا

إذا قمتُ عنّاني الحديد وأُغلت

مصارع من دوني تصمّ المناديا

جا کە عوقبە ئەمەی بیست ئازادی کردو پێی وت: خۆت بگەیەنە بە موسڵمانان–ی قەیرەوان–و کاروباری حکومەتەکەیان بۆ ڕاپەڕێنە، من دەمەوێت شەهید ببم، ئەمەی نەکردو لە وەڵامدا وتی: هەروەها منیش ئاوەتەخوازی شەهیدیم،[3] بەم جۆرە (أبو المهاجر) نموونەیەك بوو لەنێو ئەو نموونە تاك و تەرایانەی نێو پیاوان، کە دونیایان بە لاوە بێ بەهابوو، خۆشەویستی دواڕۆژ و ڕەزامەندی خودا دڵ و دەروونی داگیرکردبوون، هەر لە چوارچێوەی ئەم تێڕوانین و بیروباوەڕەدا (عوقبە)و هاوڕێ کەمەکانی خۆیان هەڵدایە نێو جەنگێکی نابەرانبەرو لاسەنگەوە، ئەگەرچی هەندێکیان دەیانتوانی ڕاکەن، بەڵام پاڵەوان ئاسا خۆیان ڕاگرت و تا هەر هەموویان لە وڵاتی (تهوذە)ی خاکی (زاب)دا شەهید نەبوون

---

١ التأريخ الاسلامي (١٣/٢٦٣).

٢ البيان المغرب (١/٢٥).

٣ الكامل في التأريخ (٢/٥٩١).

کۆڵیـان نـەدا، مێژوونووسـان دەڵـێن: گۆڕسـتانی ئـەم شـەهیدانە لـەم شـوێنەدا ناسـراوەو موسڵمانان سەردانیان دەکەن،[1] بەم چەشنە هیوایەتی (عوقبە)و (أبو المهاجر) هاتـەجێ‌و بـە یەکـەوە لـە ڕێگـەی خـودادا شـەهادەتیان بـە خـەڵات وەرگـرتو، پـاش جێبـەجێ کردنـی ئەرکەکانی سەر شانیان بە دڵو دەروونێکی ڕازی‌و ئارام‌و خۆشنوود بە پاداشتی پەروەردگار بەرەو پیری شەهادەت چوون، (عوقبە) بەم جیهادەی توانی شەقڵێکی گەورە بە دەریای ئەم بەشەی جیهاندا بداتو ڕێگایەکی وا بشکێنێت کە جێنـشینەکانی دوای خـۆی (زهـیری کـوڕی قیس البلوي‌و حسان کوڕی نەعمانی غسانی‌و موسای کـوڕی نەسـیر) درێـژە بـە کاروانەکـەی بدەن، ئەو بـەر لـە شـەهیدبوونی ڕێگـای بڵاوکردنـەوەی ئیـسلامی خـۆش کـردو جیهـادی لـە پێناوی خودادا کرد، کە بێگومان ئەم دوو خاڵە دوو ئامانجی سەرەکی ئـەو بـوونو پێکـانی.[2] شەهیدبوونی (عوقبەی کوڕی نافیع)و هاوڕێکانی لە ساڵی ٦٣ك یدا بوو، لـەو ڕۆژەدا تەمـەنی لە ٦٤ ساڵیدا بوو، لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە پێشینەکانمان ئاسـتی بـەهێزییان چـەندە بەرز بووەو، کەسێکی ئاوا کە تەمەنی لە شەست تێپەڕیووە بەڵام گەشـتێکی ئـاوا ناڕەحـەت ئەنجام دەداتو جەنگێکی ئاوا گەورەو سامناك بـەرپا دەکـات!، بـەم چەشـنە دوای جیهـادو تێکۆشانێکی نەپساوەی چل ساڵەی لەسەر یەك بۆ فـەتحکردنی بـاکوری ئـەفریقیا کـە خـاڵی سەرەتاکەی (مـصر)ە خـاڵی کۆتاییەکەشـی (مـەغریبی سـەرو)وە، ئـەم سـەرکردە جـوامێرە مەزنە بە پلەی بەرزو پیرۆزی شەهادەت گەیشت.[3]

٣_ کاریگەری جەنگی (تهوذە) ٦٣ك بەسەر موسڵمانانەوە:

جـەنگی (تهـوذە) بـۆ موسـڵمانان کارەسـات بـوو، (عوقبـەی کـوڕی نـافع)ی سـەرکردەو موجاهیدو هاوڕێکانی تێدا شـەهید بـوون، موسـڵمانەکانی ئـەوێ کۆسـتیان کـەوتو تووشـی دۆخێکی ناخۆشی پڕ لە هەڵپەهەڵپ‌و واق وڕمان‌و ترسو تۆقـان بـون، هـەر چـەندە ئەوانـەی لەگەڵ (عوقبە) شەهید ببون ژمارەیان کـەم بـوو، دەگـوترێ نزیکـەی سێـسەد سـەربازبوون، بـەڵام زۆربـەی زۆری سـوپا لـە پێـشدا ڕۆیـشتبوو لـەم بۆسـەیە ڕزگـاری ببـوو، دەکـرا خـۆی

---

١ التأریخ الاسلامي (٢٦٤/١٣)، البیان المغرب (٢٨/١).
٢ العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ٢٨٤، ٢٨٥).
٣ التأریخ الاسلامي (٢٦٥/١٣).

ڕێكخاتو له پێناو پاراستنی بوونی خۆی له (قەیرەوان)دا بەرهەڵستیەكی باش بكات، بەڵام بارو دۆخی دەرونی سەربازەكان ڕێگەی بەئەمە نەدا، (زوهێری كوڕی قەیسی بەلوی)ی جێنشینی (عوقبە) له قەیرەوان، بەخاتری شكاندنەوەی هێرشەكەی (كوسەیلە) بۆ سەر قەیرەوان، هەوڵیدا گیانی فیداكاریو بەرەنگاری بەبەر سەربازەكاندا بكاو، بەم شێوەیە هوتافی كێشا: هۆ موسڵمانینە! هاوڕێكانتان چوونە بەهەشتو، خودا چاكەی لەگەڵ كردنو شەهادەتی پێ بەخشین، جا یان ڕێگای ئەوان بگرنە بەر –كە شەهید بوونە–، یان خودا ئەمەتان لەگەڵ ناكاتو سەركەوتنتان پێ دەبەخشێ[1] بەڵام ئەم هاوارەی (زوهەیر) نەك هەر وەڵامی نەدرایەوە، بەڵكو بەسستیو ساردی نواندنو دژایەتی كردن بەر پەرچی درایەوە، بەو جۆرە (حەنشی سەنعان) لەڕووی هەڵگەڕایەوەو پێی گوت: نە بە خودا ئۆبالی ویلایەتی تۆمان له ئەستۆدا نیەو بەقسەت ناكەین، لەمرۆدا هیچ كارێك له ڕزگاركردنی ئەم تاقمە موسڵمانەوكشاندنەوەیان بەرەو خۆرهەڵاتەكەیان باشتر نیە، ئەمجا جارپیداو وتی: هۆ موسوڵمانینە! كێ دەیەوێ بەرەو خۆرهەڵات بگەڕێتەوە، با بە شوێن مندا بێتو پاشەكشە بكا، جا خەڵك بەدوای كەوتو، جگە لە كەسوكاری خۆی كەس لەگەڵ (زوهێر) نەمایەوە، ئەویش پاشان خۆی گەیاندەوە (بورقە)و تا سەردەمی (عبدالملكی كوڕی مەڕوان) لەوێداو لە كۆشكەكەی خۆیدا سەنگەری گرت[2]. هەرچی (كوسەیلە) بوو تەواوی خەڵكی (ئەفریقیا)ی لەگەڵ كەوتو، بەرەو (قەیرەوان) بەڕێكەوت، خەڵكێكی زۆری لە پیرو پەككەوتەو ژنو منداڵی موسڵمانی تێدا بەجێمابون، داوایان لە (كوسەیلە) كرد چەپاڵەیان بدا، ئەویش چەپاڵەیدانو، چووە نێو (قەیرەوان)ەوەو، بەبێ هیچ ڕووبەڕوونەوەیەك تاسەردەمی (عبدالملك ی كوڕی مەڕوان) باڵی دەسەڵاتی خۆی بەسەر ئەفریقیا دا كێشا.[3] ئەگەر چی (ئەفریقیا) له ژێر دەستی موسڵمانان دەرهێنرا، بەڵام لەبازنەی ئیسلام دەرنەچوو، ژمارەیەك لە تیرەكانی موسڵمان ببوونو لەسەر ئیسلامەتیەكەیان سووربوونو لە (قەیرەوان)یش دەژیان (كوسەیلە) حیسابی بۆ دەكردنو بەخاتری دامركاندنەوەی ڕقی تۆڵەیان دڵی

---

[1] البيان المغرب (٣١/١).

٢ المصدر نفسه (٣١/١)، النجوم الزاهرة (١٥٩/١).

٣ النجوم الزاهرة (١٦٠/١)، العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ٢٨٦).

ڕادەگرتن، کاتێك (کوسەیلە) پێشنیاری بۆ سوپاکەی خۆی کرد سەبارەت بە دەرچوونی لە (قەیرەوان)و هەڵبژاردنی شوێنێکی تر بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی سوپاکەی (زوهێر) کە لەلایەن (عبدالملکی کوڕی مەڕوان)ەوە بە هێزکرابوو، دانی بەم ڕاستیەدا هێنا، کوسەیلە وتی: من دەمەوێ بەرەو (ممس) بچمو لەوێ بگیرسێمەوە،ئەم شارە -واتە قەیرەوان- موسوڵمانگەلێکی زۆری تێدا نیشتە جێیەو، پەیمانی پاراستنی ئەوانمان لە ئەستۆدایەو ناتوانین غەدریان دەرهەق بکەین، من دەترسم کاتێك جەنگ ڕووی دا - بچنە ڕیزی سوپای ئیسلامەوەو- لەدژی ئێمە ڕاپەڕن،[1] ئەمەو (قەیرەان) دەورو بەری پێنج ساڵ ٦٤ك-٦٩ك لە ژێر دەسەڵاتی (کوسەیلە) دابوو، دوای ئەمە (زوهێری بەلوی) بە سوپایەکی گەورەوە لەلایەن (عبدالملکی کوڕی مەڕوان)ەوە پشتیوانی لێکراو، توانی لەژێر چنگی(کوسەیلە)ی ڕزگار بکات، بە ئیزنی خودا لە مەولا لەباسی سەردەمی (عبدالملکی کوڕی مەڕوان)دا باسی (زوهێر) دەکەین، لە کوژرانی (عوقبە) -رحمەالله-دا وانەیەکی کاریگەر دەست دەکەوێ کە بریتیە لە گرنگی بە ئاگابوون لە دوژمن، ئەو تێکڕای سەربازەکانی - بەرەو قەیرەوان- ناردەوەو، خۆیشی بۆ خاتری ئەوە شەهید بکرێ لەگەڵ ژمارەیەکی کەم لە جەنگاوەرانی تاك بۆوەو بە جێما، هەرچەندە ئەمە ئامانجێکی بەرزو مەزنە بەڵام شەهید بوونی ئەو کاریگەری خراپی بۆ سەر فتوحاتی باکوری ئەفریقیا هەبوو، بۆماوەی پێنج ساڵ (قەیرەوان) لە دەست موسڵمانان دەرچوو، بانگەوازی ئیسلامی دواکەوت، لە بەر ئەمەپێویستە لەسەر سەرکردەکان لەم جۆرە دۆخانەدا کێشانە لەنێوان بەرژەوەندیە باڵاکانی ئۆممەتو بەرژەوەندیە شەخسیەکانی خۆیاندا بکەن و ئەگەر بزانن بەرژەوەندی گشتی گرنگترە دەبێ بەسەر هی خۆیانیدا هەڵبژێرن ئەگەرچەزکردن بە شەهادەتیش بێ.

---

[1] ریاض النفوس (١/١٣٠)، الاسلام والتعریب في الشمال الأفریقي (١/١٣٦).

## باسی سێهەم
## فتوحاتی( معاویە ) لەبەشی خۆرهەلاتی دەوڵەتی ئومەوی:-

موسڵمانەکان تا سەردەمی (عوثمانی کوڕی عەففان) (ڕەزای خوای لێبێ) تەواوی ولاتە هەلکەوتووەکانی نێوان (عێراق‌و ڕوباری جەیحون) یان فەتح کرد، کە بریتی بون لە (جورجان‌و، ئەربەستان‌و، خۆراسان‌و، فارس‌و، کرمان‌و، سوجستان)، جا کاتێك (عثمان) شەهیدکرا، قاچەکانی بزوتنەوەی فتوحاتیش هەڵەنگوتن‌و، زۆربەی دانیشتوانی ئەو ولاتانەش لەژێر فەرمان – ی دەوڵەت– دەرچوون، سەردەمی دەوڵەتی (معاویە) خوا لێی ڕازی بێت هاتە پێشەوەو تەکانی بە خۆداو، هەوڵ تەقالایەکی باشی لەپێناو گێڕانەوەی ئەو ولاتە فەتحکرا وانە بۆ ژێر چەتری فەرمانبەرداری‌و زیندو کردنەوەی بزوتنەوەی فتوحات بەخت کرد[1].

## یەکەم: فتوحاتی: ( خۆڕاسان‌و سوجوستان‌و ئەو دیو ڕوبار ):

لەگەڵ یەکلابونەوەی فەرمانڕەوایەتی بۆ (معاویەی کوڕی أبی سفیان) خوای لێ ڕازی بێت،بزووتەوەی فتوحات سەری هەڵدتیەوە، (معاویە) (عبداللە ی کوڕی عامر)ی کرد بەوالی (بەصرە)و سەرپەرشتی جەنگی (سوجستان‌و خۆڕاسان‌و)یشی پێ سپارد[2]، هۆی هەڵبژاردنی (عبداللە) لەلایەن (معاویە)وە بۆ ئەم پۆستە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە ئەو لەو ناوچەدا شارەزای‌و ئەزمونێکی باشی ئیداری تێدا پەیدا کردبوو، لە ساڵی ٤٢ــ٤٣ك یدا (عبداللە کوڕی عامر) (عبدالرحمن کوڕی سەمورەی کوڕی جەیسی کوڕی عەبدشەمسی) کردە والی (سوجستان)، ئەویش لەگەڵ (عوبادی کوڕی حەصینی حەبستی)ی سەرۆکی دەزگای پۆلیسی‌و ژمارەیەك لە پیاو ماقوڵانی وەك (عمری کوڕی عبداللە ی معمری تیمی‌و عبداللە ی کوڕی حازمی سولەمی‌و، قوتری کوڕی فوجائەو، موهەللەبی کوڕی ئەبی سوفرەی یەزدی) بەرەو سوجستان ڕۆیشتن‌و لەم هەڵمەتەدا شاری (زەرەنج)[3] یان بە ئاشتی فەتح کردو، بە دوو

---

١ دراسة في تأريخ الخلفاء الأمويين (ص: ٢١٩).

٢ تأريخ الطبري (١٣٣/٦).

٣ (زەرنج): شارێکی گەورەیە بە ناوەندی هەرێمی سوجستان دادەنرێت، معجم البلدان (١٣٨/٣).

ملیۆن (درهەم)و دووهەزار (خزمەتکار) لەگەڵ کوێخایەکەی پێکهاتن ، ئەمجا بەرەو شارەکانی (خواش[1] و بەست[2] و خوشەك[3])و چەند شارێکی تر بەرێکەوتنو توانیان فەتحیان بکەن، هەروەها دوای گەمارۆدانێکی چەند مانگی شاری (کابول)یشیان فەتح کرد[4]، هێندەی نەخەیاند معاویە (خوای لێ ڕازی بێت) سوجستانی کردە هەرێمێکی سەربەخۆو (عبدالرحمن کوڕی سەمورە)ی لە پاداشتی ئەم چەند سەرکەوتنو فتوحاتانەی بەدەستی هێنان کرد بە والی ئەوێ[5]، ئەمەو تا لێخرانی (عبدالله ی کوڕی عامر) لە پۆستی ویلایەتی بەصرەو دامەزێنرانی (زیادی کوڕی أبی سفیان) لەجێگەی ئەو لە ساڵی ٤٥ك (عبدالحمن) لەسەر پۆستی ویلایەتی هەرێمی (سوجستان) مایەوە، دوای ئەمە هەردووك هەرێمی (خۆراسانو سوجستان) بۆ جارێکی تر خرانەوە ژێر چاودێری والی (بەصرە)، هەر کە (زیاد) لە ساڵی ٤٥ك یدا گەیشتە (بەسرە)، (خۆراسان)ی کردە چوار بەش: یەکەم (مەروە) کە (أُمَیر أحمد الیشکري) کاربەڕێوەبەری بوو و یەکەمین کەس بوو کە خەڵکی عەرەبی لە مەروە نیشتە جێ کردن[6]، دووەم: (نەیسابور) کە (خولەیدی کوڕی عبدالله ی حەنەفی) کار بەڕێوەبەری بوو، سێهەم: (مەروەو تاڵەقانو فاریاب) کە(قەیسی کوڕی هەیسەمی سولەمی) کاربەڕێوەبەری بوو، چوارەم: (هەراتو بازغیسو بوشنجو قادیس) کە (نافیعی کوڕی خالیدی تاجی ئەزدی) بەسەرەوە دانرابوو[7]، لەساڵی ٤٧ك (زیاد) شاری (مەروە)ی کردبە پایتەختی هەرێمی خۆراسان.

---

١ (خواش): شارێکە هەر لە هەرێمی سوجستان، معجم البلدان (٣٩٨/٣).

٢ (بست): شارێکە لە نێوان سوجستانو غەزنەو هەرات، معجم البلدان (٤١٤/١).

٣ (خشك): شارێکە لە دەوروبەری (کابول).

٤ فتوح البلدان (ص: ٣٩٥).

٥ فتوح البلدان (ص: ٣٩٦).

٦ فتوح البلدان (ص: ٤٠٨).

٧ تأریخ الطبري: نقلا عن خلافة معاویة للعقیلي (ص: ١٣٥).

## دووەم: دامەزراندنی حەکەمی کوڕی عەمروی غەفاری:

... پیاوێکی خۆپارێزو خۆگر بوو، بە پلەی هاوەڵایەتی گەیشتبوو[1]. ساڵی ٤٧ك جەنگی(تەخارستان)[2] ی ئەنجامداوە، سامانێکی زۆری بە غەنیمەت گرت، ئەمجا بەرەو چیای (غور)[3] بەڕێکەوتو، جەنگی لە گەڵ ئەو خەڵکانەی کرد کە لە دینی ئیسلام پاشگەز ببونەوەو، بە حوکمی شمشێر گێڕانیەوەو شاری فەتح کردو سامانێکی زۆری لێ دەستگیرکردن[4]، (موهەللەبی کوڕی ئەبی صفرە)ش لە گەڵ (حەکەم) لە خۆراسان بوو، لە چەند جەنگێکی چیاکانی (تورك) دا بەشداری (حەکەم)ی کرد، یەکێك لەو جەنگانە لە چیای(ئەشل)[5] بوو، تورکەکان تەواوی ڕێگاو شیوەکانیان لێ گرتبوون، سەبارەت بەئەمە(حەکەم) تێ مابوو سەری لێ دەرنەدەکرد، (موهەلەب) سەرپەرشتی جەنگەکەی کرد، بەردەوام خەریکی فەندو فێڵ بوو تا توانی سەرۆکێکی گەورەیان لێ بگرێت‌و بیکاتە دیل، پێی وت: یان ڕێگەمان بۆ دەکەنەوە یان دەتکوژم، وەڵامیدایەوەو وتی: لەیەکێك لەم ڕێگایانە ئاگرێکی گەورەبکەنەوە ئیدی هەرهەمویان لەدەوری کۆدەبنەوەو ڕێگایەکانی تر چۆڵ دەکەن ئێوەش هەل وەربگرن‌و بەڕێگایەکی تردا دەرچن، (موهەلەب) ئەوەی کردو، موسڵمانەکان بەخۆیان‌و دەستکەوتەکانیان بەساغ‌و سەلامەتی ڕزگاریان بوو،[6] (حەکەم) لەسەردەمی ویلایەتی خۆیدا ڕوباری (جەیحون)ی بڕی‌و بەرەو وڵاتی (ئەودیو ڕوبار)[7] پەڕیەوە -کە تا ئەو کاتە فەتح نەکرابوو-، یەکەمین موسڵمان کە لەئاوی (جەیحون)ی خواردەوە خزمەتەکارێکی (حەکەم) بوو، بەمەتاڵەکەی ئاوی لێ هەڵێنجاو خۆی لێی خواردەوەو ئەمجا دای بە (حەکەم)، ئەویش لێی خواردەوەو دەستنوێژی پێ هەڵگرت‌و دوڕکات نوێژی کردن، یەکەم کەس - لەموسڵمانان- ئەم کارەی کرد حەکەم بوو،[8] (عبداللەی

---

١ فتوح البلدان (ص: ٤٠٩).

٢ (تەخارستان): وڵاتێکی فراوانەو ژمارەیەك شار لە خۆ دەگرێت.

٣ (غور): چیایەکەو شارێکی بەم ناوەشی لێیەو کەوتۆتە نێوان (هەرات‌و غەزنە)وە.

٤ الكامل في التأريخ (٢/٤٧٨).

٥ (ئەشل): چیایەکە لەسەر سنووری خۆراسان.

٦ الكامل في التأريخ، نقلا عن قادة الفتح الاسلامي في بلاد ما وراء النهر (ص: ١١٨).

٧ (ما وراء النهر= ئەودیو ڕووبار) (جەیحون) لە (خۆراسان)ەو ئەو شوێنانەی کەوتوونەتە خۆرهەڵاتەوە پێیان دەوترێت ئەودیو ڕووبار، شوێنەکانی خۆرئاواشی بریتین لە خۆراسان‌و ویلایەتی خوارەزم، معجم البلدان.

٨ الكامل في التأريخ (٢/٤٧٨).

کوڕی موبارەك) بەپیاوێکی خەڵکی (سەغانیات)ی گوتبوو کێ وڵاتەکەتی فەتح کرد؟ کابرا وتی: نازانم! ! وتی: (حەکەمی کوڕی عەمروی غەفاری) فەتحی کرد[١]، ئەمەو (حەکەم) لە ساڵی ٥٠ك کۆچی دوایی کردو[٢]، هاوەڵی مەزن (غالبی کوڕی فوزالەی لەیسی) جێگەی گرتەوەو، لەناردنی هێرشی سەربازی بۆ فەتحکردنی(تەخارستان) درێژەی بەسیاسەتی (حەکەم)دا بەڵام لەگەڵ بەختکردنی هەموو ئەو هەوڵو تەقالایانەی دانی هیچ پێشکەوتنێکی وا بۆ فەتحکردنی (تەخارستان) نەهاتە دی کەشایانی باسکردن بێ[٣]، لەبەر ئەمە (زیاد) (غالب)ی لێخستو (ربیع ی کوڕی زیادی حارسی) خستە جێگاکەی، (ربیع)کە ماوەی حوکمگێڕانی لە خۆراسان لە ٥٠ــ٥٣ك بوو[٤]، لەمیانەی ئەمەدا توانی (بەڵخ) بە ئاشتی وڕێکەوتن لەگەڵ دانیشتوانەکەی فەتح بکات، ئەمجا بەرەو (کوهستان) بەڕێکەوتو بەجەنگو زەبرو زەنگ فەتحی کرد، دوایە (عبداللە)ی کوڕی لە ساڵی ٥٣ك یدا بۆماوەی چەند مانگێك پۆستەکەی بەڕێوەبرد، ئەمجا (خلیدی کوڕی عبداللە ی حەنەفی) جێگەی گرتەوە، (خلید) یش درێژەی بەمە دا تا لە ساڵی ٥٤ك یدا (عبیداللە ی کوڕی زیادی کوڕی أبی سفیان) لەلایەن (معاویە)وە خوای لێ ڕازی بێت بە کاربەڕێوەبەری هەرێمی خۆراسان دامەزرێنرا، لەو دەمەدا (عبیداللە) تەمەنی ٢٥ ساڵ بوو و ماوەی دوساڵی(٥٤ــ٥٥) لە سەر ئەم پۆستە مایەوە[٥].

## سێهەم: عبیداللە ی کوڕی زیاد:

..... هەرکە (عبیداللە) گەیشتە (مەروە)، بەسەرکردایەتی هێزێکی بیستو چوار هەزاریو بە سواری وشتر لە ڕوباری (جەیحون) پەڕیەوەو (رامیسینو[٦] نەسەفو[٧] بیکندە[٨])ی فەتح کرد، (خاتونشا)ی شای بوخارا هاواری لەگەڵی تورك بەستو،ئەوانیش بەژمارەیەکی زۆرەوە بەهاواریەوە هاتنو پشتگیریان لێکرد، موسڵمانەکان پێیان گەیشتنو دوای جەنگێکی

١ فتوح البلدان للبلاذري (ص: ٤٠٠)، قادة الفتح الاسلامي في بلاد ماوراء النهر (ص: ١١٨).
٢ طبقات لإبن سعد (٢٩/٧).
٣ خلافة معاوية للعقيلي (ص: ١٣٦).
٤ فتوح البلدان (ص: ٤٠٩)، خلافة معاوية للعقيلي (ص: ١٣٦).
٥ تأريخ الطبري، نقلا عن خلافة معاوية (ص: ١٣٨).
٦ الكامل في التأريخ (٥٠٦/٢).
٧ نفس المصدر (٥٠٦/٢).
٨ نفس المصدر (٥٠٦/٢).

دەستەو یەخە شکاندنیانو بەسەریاندا سەرکەوتن[١]، (خاتونشا) داوای ئاشتیو چەپاڵەدانی کرد، (عبیداللە)ش لە بەرانبەر یەك ملیۆن درهەم لەگەڵی پێکهاتو چەپاڵەیدا، ئیدی (بیکندە) فەتحکراو (بوخارا)ش مایەوە[٢]، وەك باسکراوە (عبیداللە) لەم جەنگو جیهادەی (خۆراسان)دا لە بەرانبەر (تورك) ئەنجامیدا ئازایەتیونەبەردیەکی مەردانەی نواندوە،[٣] شایەد عەیانێك دەڵێ: کاتێك لە گەڵ تورکەکانی (خۆراسان) پێکهەڵشاخاین کەسێکم نەدەبینی لە (عبیداللە ی کوڕی زیاد) ئازاو بەجەرزەبەتر بێ، دەمبینی جەنگ دەکاتو هەڵمەتیان دەکاتە سەرو شمشێر وەشێنیان دەکاتو دەڕوا دەڕوا تا لە بەرچاوی ئێمە هون دەبێو، ئەمجا تەماشادەکەم ئاڵاکەی بەرز دەکاتەوەو خوێنی لێ دەچۆڕێ، ئەمەو (عبیداللە) ماوەی دوو ساڵ لە (خۆراسان) مایەوەو[٤] پاشان لە ساڵی ٥٥ك یدا پۆستی ویلایەتی (بەسرە) ی پێدرا[٥].بە خۆیو ژمارەیەك لە دانیشتوانی (بوخارا) هاتەوە بۆ (بەصرە)[٦] ئەمانە ژمارەیان دوهەزار بوو، نیشانە شکێن بونو لە تیراندازیدا دەستێکی باڵایان هەبوو[٧].(عبییداللە ی کوڕی زیاد) لەڕۆژگاری (معاویەو یەزیدو مەڕوانو عبداللمك) دا بەرزترین پۆستی ئیداری پێ دەدراو، جێگای متمانەی (بەنی ئومەییە) بوو، ئەو لەمیانەی حوکمگێڕانیداو بەخاتری سەپاندنی دەسەڵاتی خۆی پەیڕەوی لە سیاسەتی دڵڕەقیو توندی تیژیو زەبرو زەنگ دەکردو، لەم پێناوەدا بەلایەوە گرنگ نەبوو کە چ جۆرە هەنگاوێکی تۆقێنەرانە هەڵێنێ لە (کوشتنو ئازارو ئەشکەنجەدانو دەستبەسەر داگرتنو زەوتکردنی سەروەتو سامانی خەڵك)[٨]، دارای کەسایەتیەکی سەر کەش بوو و حەزی لە سەرۆکایەتی کردنو زاڵبون دەکرد، ڕاستو دروست (عبیداللە ی کوڕی زیاد) بەدکاربو، ئەو هەڵسو کەوتە نەفامەی ئەو نواندی لەکوشتنی (حوسێن) خوای لێ ڕازی بێت بەبێ ئەندازە کاریگەری لەسەر ڕۆژگاری خۆیو دوای خۆیشی بە جێ هێشت، بەردەوام هەتا ئیمڕۆ ئۆممەتی ئیسلام بەدەست ئەنجامەکانی

---

١ تأريخ اليعقوبي (٢/٢١١)، قادة الفتح الاسلامي في بلاد ماوراء النهر (ص: ١٢٥).

٢ فتوح البلدان (ص: ٤٠١)، قادة الفتح الاسلامي في بلاد ماوراء النهر (ص: ١٢٥).

٣ الكامل في التأريخ، نقلا عن قادة الفتح الاسلامي (ص: ١٢٥).

٤ الكامل في التأريخ (٢/٥٠٦).

٥ الكامل في التأريخ (٢/٥٠٧).

٦ الكامل في التأريخ (٢/٥٠٦).

٧ الكامل في التأريخ (٢/٥٠٦)، فتوح البلدان (ص: ٤٠١).

٨ قادة الفتح الاسلامي في بلاد ماوراء النهر (ص: ١٣٥).

ئەم تاوانە گەورەوە دەناڵێنێ[١]، بەئیزنی خودا ئەمە بەدرێژی لە میانەی باسی کوژرانی (حوسێن) (خوای لێ ڕازیبێت) دا باس دەکەین، لە ساڵی ٥٥ك (ئەسلەمی کوڕی زەرعەی کیلابی) لە لایەن (معاویەی کوڕی أبی سفیان)ەوە بەسیفەتی (والی) ئەو هەرێمەو بۆ جێگرتنەوەی (عبیداللە ی کوڕی زیاد) بەرەو (خۆراسان) بەڕێکرا، ئەویش ماوەی ساڵێك لەم پۆستەدا مایەوە[٢].

## چوارەم: سەعیدی کوڕی عثمان ی کوڕی عفان (٥٦ك):

سەرچاوە مێژووییەکان دەڵێن: (سەعیدی کوڕی عثمان ی کوڕی عفان) بە سیفەتی (والی) بەرەو (خۆراسان) ڕۆیشتو، نزیکەی چوار هەزار پیاوی لەگەڵدا بوو، کە لە نێویاندا ژمارەیەك لەپیاو ماقوڵی هۆزە عەرەبیەکانی (بەسرەو کوفە) بەدی دەکرانو، پەنجا کەسێکی تریش لە گێرەشێوێنو چەتەو ڕێگری وەك (مالیکی کوڕی ڕیبی مازنی تەمیمی)یشیان لە نێو دابون کە ئەمانە تۆبەی تەواویان کردبوو و بڕیاریاندابوو لە ڕێی خودادا جیهاد بکەن[٣]، (مالیکی کوڕی ڕیب) دەڵێ:

ألم ترني بعت الضلالة بالهدى

وأصبحت في جيش إبن عفان غازياً[٤]

واتە: نامبینی (گومڕایی)م بە (ڕێنمایی)داوە

لەڕێزی سوپای کوڕی عەفان چومە نێو غەزاوە.

(سەعید) لە خۆراسان بەڕێکەوتو لە ڕووباریداو بەرەو (سەمەرقەند) پەڕیەوە، لە کاتی پەڕینەوەی ڕووباردا بە (خاتونشا)ی شای بوخارا گەیشت، (خاتونشا) ئەو پەیماننامە ئاشتیەی بۆ هێنابوو کە پێشدا لەگەڵ (عبیداللە ی کوڕی زیاد) لە سەری ڕێککەوتبو، دانیشتوانی (سوغدو کیشو نەسف) کەژمارەیان سەدو بیستو چوار هەزار جەنگاوەر دەبوو لە (بوخارا) بەرەنگاری (سەعید)و سوپاکەی بونەوە، ئیدی (خاتونشا)ش لە پێدانی سەرانەکەی پەشیمان بۆوەو، پەیمانەکەی شکاند، بەڵام بەشێك لە سوپا کەڵەکەبووەکەی دژبە (سەعید) بەر لە دەست پێکردنی جەنگ وازیان هێناو گەڕانەوە، ئەمە کاری لە دۆخی

---

١ المصدر نفسه (١٣٧).

٢ خلافة معاوية للعقيلي (ص: ١٣٩).

٣ خلافة معاوية للعقيلي (ص: ١٤٠).

٤ الشعر والشعراء لإبن قتيبة (١/٣٥٤).

دڵی ئەوانی تر کردو ورەی ڕوخاندن، کاتێك (خاتونشا) ئەمەی بینی گەڕایەوە بۆ سەر سوڵحەکە، جا (سەعید) بەسەرکەوتویی چوە نێو (بوخارا)و،[1] داوای لە (خاتون) کرد هەشتا لەو کەسە دیارانەی وڵاتەکەی بۆ لا ڕەوان بکا کە پێشدا سەرکردایەتی ئەو هێزانەیان کردووە کە لە فەرمانی خودی (خاتونشا) دەرچووبوون‌و، ئێستاش لە هەڵگەڕانەوەیان‌و غەدرو خیانەتیان دەترسێت‌و مایەی مەترسین بۆ سەرکورسی دەسەلاتی، ئیتر بە لەکۆڵکردنەوەی ئەم کەسانە (خاتونشا) لەو دوژمنە سەر سەختانەی ڕزگار بوو کە هەڕەشەیان لە کورسیەکەی‌و ئێستاو ئایندەی دەکرد، کاتێك صوڵحەکەی نێوان سەعیدو خاتون تەواو کرا، (خاتونشا) — کە دەگوترێ لە جوانی‌و شۆخ‌و شەنگیدا تاق بووە— بە زەڕق‌و بەڕق‌و پۆشاکی شایانەی هاتە دەرو، بەرەو بارەگای تایبەتی (سەعید) ڕۆیشت‌و، سەردانی کرد، بەگوێرەی پڕو پاگەندەی خەڵکی (بوخارا) سەرکردەی موسڵمان یەجگار بە جوانی‌و قەشەنگیەکەی سەرسام بوەو بەچەشنێك ئەم سەرسامیەی (سەعید) لە گۆرانیە فۆلکلۆریەکاندا هاتوەو، هەتا ئیمڕۆشی لە گەڵدابێ خەڵکی بوخارا دەیانڵێنەوە، بەڵام ئەمە لە سەرچاوە عەرەبیە ئیسلامیە باوەڕپێکراوەکاندا باسی لێوە نەکراوە، ئاشکرایە ئەمە زیاتر لە خەیاڵی ئەدیب‌و شاعیرو شایەرانەوە نزیکترە لەوە کە ڕاستیەکی مێژویی بێت، (سەعید) بەرەو فەتحی (سەمەر قەند) ڕۆیشت‌و (خاتونشا)ش خەڵکی (بوخارا) ی لەگەڵ سوپاکەی خست، لە بەرانبەر دەروازەی سەمەرقەند سەربازگەی خست‌و سوێندی خوارد: هەتا فەتحی نەکا ئێرە بەجێ ناهێڵێ، ئەمەو سوپای ئیسلام ماوەی سێ ڕۆژ لەگەڵ خەڵکی (سەمەرقەند) بەشەڕهاتن، جەنگەکە لە ڕۆژی سێهەمیدا لەو پەڕی گەرمیدا بوو، بەجۆرێك (سەعید) چاوێکی لە دەستدا، ئەمەو خەڵکی شار کارێکی وایان کرد وا لە (سەعید) بکا ئەو کۆشکەی بەرانبەری بەزەبرو زەنگ بگرێت‌و هەموو ئەوانەش بکوژێ کە خۆیان تێدا قایم کردبوو، جا داوای ئاشتیان کرد، (سەعید) یش سوڵحی لە گەڵ کردن لەسەر: (حەوتسەد هەزار درهەم‌و، ژمارەیەك لە کوڕانی گەورەکانیان بەبارمتە ڕادەست بکەن‌و، خۆی‌و هەر کەسێك ئەو حەزبکا بچنە نێو شارەوەو بەدەروازەکەی تریشدا دەربچن)، جا بیست‌وپێنج، بە پێی گوتەیەکی تر چل، بە گوێرەی ڕیوایەتێکی تر هەشتا کوڕیان لە میرزادەکانیان — وەك بارمتە— ڕادەست کردن[2] ئەمەو (سەعید) لەم گەشتە غەزایەیدا ژمارەیەك گەورە سەرکردەی لە گەڵ بوون کە

١ قادة الفتح الاسلامي في بلاد ماوراء النهر (ص: ٨٢)، تأريخ الطبري (٦/٢٢٤).

٢ فتوح البلدان (ص: ٤٠١، ٤٠٢)، قادة الفتح الاسلامي في بلاد ماوراء النهر (ص: ١٤١).

یەکێکیان (موهەللەبی کوڕی ئەبی سوفرەی ئەزدی) بووە، لەم جەنگەدا (قەسمی کوڕی عەباسی کوڕی عبدالمطلب) کە لە بیچمیدا شێوەی پێغەمبەر (ﷺ)ی دەکرد، شەهید بوو[١]، (عبدالله ی کوڕی عباس)ی برای لە (طائف) نێژراوەو، (مُعَبَّد)ی براشی لە (ئەفریقیا) شەهید بووەو، (عبیدالله)ی براشی لە (مەدینە) نێژراوە، —ئەم دەستە برایە — هەمویان برای داکۆبابین، خودای بەرزو بالا دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾[٢] واتە: کەس نازانێ سبەینێ چ دەکاو، کەس نازانێ لە چ خاکێك دەمرێ، هەر خودا زاناو ئاگادارە.

.... ئەمەو (سعید) بەرەو (ترمون) بای دایەوەو بەئاشتی فەتحی کرد[٣]، (سەعید) شاعیربووەو، لەم هۆنراوەیەیدا لە —مەتحی — معاویەدا دەڵێ:

ذكرت أمير المؤمنين وفضله — فقلت جـزاه الله خيراً بما وصل
وقد سبقـت مني إليــه بوادر — من القول فيـه آفة العقل والزلل
فعاد أمير المؤمنـــين بفضله — وقد كان فيــه قبل عودته ميل
وقال خراسـان لك اليوم طعمه — فجوزى أمير المؤمنين بما فعل
فلوكان عثمـان العــداة مكانه — لما نالني من ملكه فوق ما بذل.[٤]

ساڵی ٥٧ك (معاويه) (سەعید)ی لێخست، (سەعید) بڕەسامانێکی لە داهاتی بەیتولماڵەی خۆراسان هەڵگرت، (معاويە) لە (حەلوان) نەفەری ناردنە سەر ڕێگەی[٥]و سامانەکەی لێ سەندەوە، ئیدی (سعید) میرزادە بارمتە کراوەکانی (سەمەر قەند)ی لە گەڵ خۆی بردنە نێو شاری (مەدینە) ەوە، پۆشاکو پشتێنەکانی ئەوانی دا بەخزمەتکارەکانیو، خوریشی خۆیشی لەبەر ئەوان کردو، ئاودێریو کارکردنی پێ سپاردن[٦]، بردینە نێو پارچە زەویەکی خۆیەوەو کاری کێڵانی پێ دەکردن، ڕۆژێك دەرگای دیواریان لێ داخستو هەڵیان کوتایە سەریو کوشتیان ئەمجا خۆشیان کوشت[٧]. خالدی کوڕی عوقبەی کوڕی أبی معیط ی ئومەوی دەڵێ:

---

١ شذرات الذهب (٦١/١)، قادة الفتح الاسلامي في بلاد ماوراء النهر (ص: ١٤٢).
٢ سورة لقمان ٣٤.
٣ فتوح البلدان (ص:٤٠٢)، قادة الفتح الاسلامي في بلاد ماوراء النهر (ص: ١٤٢).
٤ قادة الفتح الاسلامي في بلاد ماوراء النهر (ص: ١٤٤).
٥ المصدر نفسه (ص: ١٤٣، ١٤٤).
٦ فتوح البلدان (ص: ٤٠٢، ٤٠٣).
٧ فتوح البلدان (ص: ٤٠٣)، قادة الفتح الاسلامي في بلاد ماوراء النهر (ص: ١٤٢).

ألا إن خير الناس نفساً ووالداً   سعيد بن عفان قتيل الأعاجم
فإنن تكن الايام أردت صروفها   سعيداً فهل حي من الناس سالم؟

لەم هۆنراوە خەمئامێزەیدا دەڵێ:

ياعين جودي بدمع منك تهتانا   وأبكي سعيد بن عثمان بن عفانا

(سەعید) میرزادە بارمتە کراوەکانی بۆ دانیشتوانی (سەرمەقەند) نەگێڕانەوەو بێ بەڵێن دەرچوو، نەك هەر بۆی نەگێڕانەوە بەڵکو بەرەو (مەدینە)ی هێنانو، لە گەڵ ئەوەدا ئەمانە کوڕانی میرو شاو پیاو ماقوڵەکان بونو لە نازو نیعمەتدا گەورە ببون، بەڵام (سعید) لە نێو باخی خورمادا بێڵکاریو پاچکاریو ئاودێری پێ دەکردن، ئیتر تاقەتی ئەم کارەیان نەبوو، لەژیانی خۆیان بێزار بوونو هەڵمەتیان بۆ بردو کوشتیان، بەم جۆرە (سەعید) ستەمی لێکردنو،[1] ستەمەکەشی بەسەر خۆیدا شکایەوە ژیانی خۆی بەقوربانی ئەم ستەمو پەیمانشکێنەی کرد[2].

لە ڕاستیدا سەعید پیاوێکی ئازاو جوامێرو بە شەهامەت بوو و حیسابی بۆ کەسایەتی خۆی دەکردو، لە بەرزیانی دەڕوانیو، خۆشگوزەرانو نانبدەو دڵاوابوو، یەکێك بوو لەکەسە هەرەدیارەکانی قورەیش[3].

## پێنجەم: ( سلم ی کوڕی زیاد ) ی برای عبیدالله ی کوڕی زیاد ٥٧ك:-

(معاویەی کوڕی أبی سفیان) لە ساڵی ٥٧ك یدا (سعیدی کوڕی عثمان ی کوڕی عفان) ی لە سەر ویلایەتی (خۆراسان) لابردو، بەگوێرەی ڕیوایەتێك: ئەم ویلایەتەی خستە سەر ویلایەتی (بصرە)ی سەر (عبیدالله ی کوڕی زیاد)[4].بەپێی گێڕانەوەیەکی تر: لە ساڵی ٥٩ك یدا: (معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان) (عبدالرحمن کوڕی زیاد)ی کرد بە والی (خۆراسان)، ئەو پیاوێکی ماقوڵ بوو، بەڵام لەبواری فتوحاتدا هیچی نەکرد[5]. کە (معاویە)کۆچی دوایی کرد(عبدالرحمن ی کوڕی زیاد) لەسەر ویلایەتی (خۆراسان) مابۆوە کاتێك (سلم ی کوڕی زیاد) — بەفەرمانی (یەزید) بە سیفەتی والیایەتی ویستی— بەرەو (خۆراسان) بەڕێ بکەوێ

---

١ قادة الفتح الاسلامي في بلاد ماوراء النهر (ص: ١٤٣).
٢ المصدر نفسه (ص: ١٤٣).
٣ الكامل في التأريخ (٢/٥١٤).
٤ النجوم الزاهرة (١/١٤٩)، قادة الفتح الاسلامي في بلاد ماوراء النهر (ص: ١٤٨).
٥ قادة الفتح الاسلامي في بلاد ماوراء النهر (ص: ١٤٨).

(یەزید) نامەیەکی بۆ (عبیداللە ی کوڕی زیاد) — ی والی عێراق — ی برای (سلم) نارد تا شەش هەزار بەوتەیەکی تر دوو هەزار ئەسپسواری هەڵبژاردەی لە گەڵ بنێریّ، هەرچی (سلم) بوو خەڵکانی دیارو ماقوڵی هەڵبدەژاردن ئەمەو (عمران کوڕی فضیلی بورجومیو موهەلەبی کوڕی ئەبی سوفرەو عبداللە کوڕی حازمی سوللەمیو، طلحةی کوڕی عبداللە ی کوڕی خەڵەفی خوزاعی)و ، خەڵکێکی زۆر لە سەرکردەو پیاو ماقوڵانی شاری (بصرە)ی لە گەڵ ڕۆیشتن، (سلم) تەواوی ئەو سوارچاکانەی لە (بصرە)کۆکردنەوەو هێزێکی ڕێکو پێکی سەربازی لێ ڕێکخستنو ئەمجا بەرەو (خۆڕسان) بە ڕێکەوت[1].- (سلم) هێرشی کردە سەر (خوارەزم)، لەسەر چوار سەد درهەم صوڵحیان لە گەڵ کرد، ئیدی لە ڕوباری (جەیحون) پەڕیەوەو (أم محمد)ی هاوسەری کە دەکاتە کیژی (عبداللە ی کوڕی عوسمانی کوڕی ئەبیعاسی سەقەفی) یشی لە گەڵ دابو، ئەو یەکەمین ژنی عەرەبی بوو بەو ڕوبارەدا بپەڕێتەوە، گەیشتە (سەرمەقەند)و دانیشتوانەکەی ئاشتیان لەگەڵ کرد[2]، تەماشای کرد (خاتونشا)ی شای بوخارا ڕێکەوتننامەکەی هەڵوەشاندۆتەوەو، هاواری لە (سوفد)و تورکە باکوریەکانی هاوسێی بەستووە، (تەرەخون) بەسەرکردایەتی سوپای (سوفد)و تورکەکانیش بەسەرکردایەتی پاشاکەیان لە سوپایەکی گەورەدا هاتنە پێشەوە، سوپای ئیسلام بەبینینی ئەم ڕەشەسوپا زەبەلاحەی دوژمن باری دەرونی تێك نەچوو ورەی نەڕوخا، بەمەبەستی ڕاوەستانی لە بەرانبەر وردەکاریەکانی دوژمنو جەنگەکانی بەبێ پەلاماردان (بوخارا)ی گەمارۆدا، ئیتر خۆی دامەزراندو لە بەرانبەر دوژمندا سەنگەری گرت، (سلم) (موهللە بی کوڕی ئەبی سوفرەی ئەزدی) ڕاسپارد چاودێری بارو دۆخی دوژمن بکا، (موهەللەب) پێشنیازی کرد کە ئەم ئەرکە بەکەسێکی دیکە بسپێریّ، بە بەڵگەی ئەوە کە ئەو لەنێو هۆزەکەی خۆیو تەواوی موسڵمانەکاندا دیارو ناسراوەو، دیارنەمانی لە نێو سەربازگەدا خێرا دەزانرێتو بڵاو دەبێتەوەو، پاشانیش ڕازی ئەو ئەرکەی خراوەتە ئەستۆی دەردەکەویّ، ئەمە لە حاڵێکدا بەخاتری ئەوە ئەم ئەرکە بەو پەڕی لە سەر هەستیو هۆشیاریو نهێنیەوە تەواو بکریّو ئامانجی خۆی بپێکیّ پێویستە بەشاراوەیی بمێنێتەوە، چونکە بڵاو بونەوەی موسڵمانەکان

---

١ الكامل في التأريخ، نقلا عن قادة الفتح الاسلامي (ص: ١٤٩).

٢ قادة الفتح الاسلامي في بلاد ماوراء النهر (ص: ١٤٩)، فتوح البلدان (ص: ١٤٩).

دەخاتە مەترسیەکی یەجگار گەورەوە، بەڵام (سلم) سوربو لەسەر ئەوە کە تەنها دەبێ (موهەللەب) ئەم ئەرکە هەستیارە جێ بەجێ بکات‌و، خەڵکی تر ناتوانن وەکو پێویست رایپەڕێنن، ئەمەو لە هەر لیوایەك پیاوێکی هەڵبژاردو لە گەڵ ئامۆزایەکی خۆی ئامادەی کردن‌و بەڕێی کردن، (موهەللەب) مەرجی لەسەر (سلم) دانا بەهیچ کلۆجێك لەلای هیچ کەس رازی ئەم ئەرکە نەدرکێنێ، ئەم بەشەو لە گەڵ تاقمەکەی بەڕێکەوت‌و، لە شوێنێکی نەدیار بۆسەی داناو سێرەی لە دوژمن گرت‌و، بەبێ ئەوە دوژمن بە شوێنەکەی بزانێ بەکەیفی خۆی زانیاری لە سەر جموجۆڵ‌و وردەکاریەکانی سوپاکەی وەردەگرت، لە کاتی نوێژی بەیانیدا هۆزەکەی‌و موسڵمانەکان تەماشایان کرد (موهەللەب) دیارنیە، ئاخر کەسێکی ئاوا پایەدارو ناودارو رێزدار ناکرێ خەڵك لێی نەپێچێتەوە، بۆیە دەورەیان لە (سەلم) داو زۆریان لێکرد کە پێیان بڵێ چی لێهاتووەو بۆ کوێ چووە، ئیدی نەیتوانی بیشارێتەوە کە بۆچی چووەو چ ئەرکێك ئەنجام دەدا، هەواڵی دانێ کە ئەو بەشەو بۆ ئەنجانمدانی ئەرکی هەواڵگری ناردویەتی، هەر بڵێی یەکو دوو هەواڵەکەی بەنێو سەربازگەدا بڵاو بۆوە، تاقمێك موسڵمان بە پەلە سوار بوون‌و بەرەو ئەو شوێنە چون کە (موهەللەب) خۆی تێدا حەشاردابوو، حەشارگەکەی موهەللەبیان لەبەرچاوی دوژمن ئاشکرا کرد، (موهەللەب) لە دورەوە چاوی لێبوون کە بەنارێك‌و پێکی‌و ئاڵۆزو باڵۆزی پێشبڕکە دەکەن‌و بۆ لای ئەو دێن، لە سەر ئەمە کە بەبێ هیچ پاساوێکی دروست شوێنی خۆی‌و هاوەڵەکانیان لەبەر چاوی دوژمن ئاشکراکردوەو تووشی مەترسی گەورەیان کردوون سەرزەنشتی کردن، (موهەللەب) بەخاتری دەربازبون لەم مەترسیەی تێی کەوتوون‌و چارەسەر کردنی ئەو گرفتەی پێیەوە گیرۆدەبون ئەو پەڕی هەوڵ‌و تەقالای خۆی بەخت کرد، سەرژمێریەکی ئەو تاقمەی کرد کە پەیوەندیان پێوە کردوە، تەماشای کرد ژمارەیان نۆسەد ئەسپ سوارە، پێی گوتن: سوێند بەخوا لەسەر ئەم کارەتان پەشیمان دەبنەوە، پێشبینیەکەی هاتە دی، هێشتا خۆیان رێك نەخستبوو و نەحەسابونەوە کە تورکەکان شاڵاویان بۆ هێنان‌و چوار سەد موجاهیدیان لێ کوشتن‌و ئەوانی تریشیان ناچار بەهەڵاتن کران، ئەمجارە (موهەللەب)و هاوڕێ کەمە هەواڵگرەکانی گەمارۆدران، بەڵام چیائاسا خۆی ڕاگرت، بە نیسبەت وێنەی پیاوێکی ئاواوە مەرگ لە هەڵاتن خۆشتر بوو، یەکبەخۆ بە دەنگە گەورەکەی خۆی هاواری لە سوپای ئیسلام بەست، کە تەنها

نیو فەرسەخ لە گۆڕەپانی ڕووبەڕووبوونەوەکە دووربوو ،دەنگەکەی بیسترا، موجاهیدانی هۆزی (ئەزد)ی خزمی خۆی بەپەلە بەهاواریەوە چوون‌و، بەخاتری ئەوە تا موسڵمانەکان بە خۆی‌و بەسەرکردایەتی (سەلم) دەگەنە جێ تورکەکانیان بەخۆیانەوە خەریك کردن، جەنگ لە نێوانیاندا دەستی پێکرد، موسڵمانەکان کارێکی وایان بە تورکەکان کرد بابەدەواری شەڕی نەکردبێ‌و چۆکیان شکاندن‌و شکستیان دەرخوار دان، بەچەشنێك لە گۆڕەپانی جەنگ هەڵاتن‌و هەمو سەروەت‌و سامان‌و کاڵاکانیان لەدوای خۆیانەوە بەجێ هێشت‌و کەوتنە دەست موسڵمانەکان، کار بەوە گەیشت هەر ئەسپسوارێك (دووهەزارو چوارسەد) بەپێی ڕیوایەتێکی تر (دەهەزار) درهەمی بەرکەوتوە، ئیتر موسڵمانەکان تورکەکانیان ڕاونان‌و، جگە لە پەڕیدەکانیان کەسیان لێ ڕزگار نەبوو، (بندون) یان (بیدون)ی سوغدی پاشای (سوغد) یەکێك بوو لە ڕیزی کوژراوەکان، (خاتونشا) سەر لەنوێ داوای سوڵحی کردەوە، ئیدی جارێکی تر (بوخارا) فەتح کرایەوە، (سەلم) لە (سوغد) بوو، سوپایەکی سازکردو بەرەو (خوجەندە)ی بەڕێکرد، بەڵام سوپاکە شکا، (ئەعشا هەمدان)ی شاعیر کە لە جەنگەکەدا بووە دەڵێ:

لیت خیلي یوم الخُجْندة لم یهزم
وغـودرت في المكـر سـلیبـا
تحضـر الطیر مصرعي وتروحت
إلى الله في الدمـاء خصیبـاً[١].

شیاوی باسە بەر لە (سەلم) والیەکانی (خۆراسان) دەچون بۆ غەزا، بەڵام کە زستان دادەهات دەهاتنەوە بۆ (مەروەزی شاهجان)، جا کەموسڵمانەکان دەگەڕانەوە، میرەکانی خۆراسان لە شارێکی سەر بە (خوارەزم) کۆدەبوونەوەو، پەیمانیان دەدا کە شەڕ بەیەکدی نەفرۆشن‌و سەبارەت بەکاروبارەکانیان ڕاوێژ بە یەکتر بکەن، جا کاتێك (سەلم) گەیشتە (خۆراسان) لە یەکەم زستاندا غەزای کرد، (موهەللەب ی کوڕی ئەبی سوفرە) تۆبزی لێکرد کە بەرەو ئەو شارە بچێ، ئەویش بە شەش هەزار، دەشڵێن بە چوار هەزار جەنگاوەرەوە بەرەو ئەوێ بەڕێکەوت، ئیتر گەمارۆیان دان، داوایان لێکرد لە بەرانبەر دەرچونیاندا ئاشتیان

١ فتوح البلدان (ص: ٥٨١)، الكامل في التأريخ (٢/٥٨٤).

لە گەڵ بكا. ئەو وەڵامی بە ئەرێ دانەوەو، ئەوانیش لەسەر پێدانی بیستو چەندهەزار درهەم لەگەڵی پێكهاتن، بە پێی ڕێكەوتنەكە دەبوایە كەڵو پەڵو كاڵاشیان لێ وەربگرێ، ماڵاتی بە نیوە نرخ لێ وەردەگرتن، ئەمەو بەهای هەمو ئەو شتانەی لێی وەرگرتن خۆی لە (پەنجا ملیۆن) درهەم دەدا[1]، (سەلم) دوای كۆتایی هێنان بەم جەنگەی كە لە هەردوك ساڵی ٦١و٦٢ك یدا بەردەوام بوو، بەرەو (مەروە) گەڕایەوە، وەك دەردەكەوێ ئەو بۆ جاری دووەمو لە ساڵی ٦٣ك یدا لە ڕوباری داوەو پەڕیوەتەوە[2]. چونكە زانیبووی كە نەتەوەی (سوغد) گەلەكۆمەیان لە دژ كردوە، ئەویش بۆیان پەڕیەوەو شەڕی گەڵ كردن[3]. بەڵام بەمەبەستی چارەسەركردنی كێشەكانی ناوخۆ بە پەلە بەرەو (مەروە) گەڕایەوە، لەو دەمەدا ئاشوبگەل وێنەی پەردە ڕەشە ئەنگوستە چاوەكانی شەوگار بەڕێوەبون[4]. ساڵی ٦٤ك (یەزیدی كوڕی معاویە) مردو، دوای ئەوە بەیعەت بە (معاویەی كوڕی یەزید)دراو، خیلافەتی ئەویش تەنها سێ مانگی خایاندو كۆچی دوایی كرد، دەشگوترێ: تەنها چل ڕۆژ دەستی بە جڵەوی حوكمڕانیەوە بوو پاشان مردوە[5]. ئیدی غەیری ئەمەش گوتراوە، كاتێك (سەلم) هەواڵی مەرگی (یەزید)ی پێ گەیشت، ئاشكرای نەكرد، بەڵام چۆن ئاگر لە پوش بەر دەبێ ئاوا هەواڵەكە بەنێو خەڵكی (خۆراسان)دا بڵاو بۆوە، ئیدی هەواڵێكی لەم چەشنە ناكرێو نابێ ماوەیەكی دورو درێژ بشاردرێتەوە، بۆیە كاتێك (سەلم) زانی هەواڵەكە لە نێو خەڵكدا بڵاو بۆتەوە، ئەمجا ڕایگەیاند كە (یەزیدی كوڕی معاویە)و (معاویە)ی كوڕیشی كۆچی دواییان كردوە، بانگهێشتی موسڵمانەكانی كرد تا كاتێك خەڵك لە سەر دیاری كردنی (خەلیفە) یەك كۆك دەبن بەیعەتی ڕەزامەندی پێ بدەن، جا بەیعەتیان پێدا، بەڵام دوای تێپەڕینی دومانگ بەیعەتەكەیان هەڵوەشاندەوە، هەرچەندە (سەلم) پیاوێكی چاكو خزمەتگوزارو خۆشەویستو لە بەردڵ بوو لە نێویانداو، خەڵكی (خۆراسان) یش تا ئەو كاتە والیەكی وێنەی (سەلم)یان دەست نەكەوتبوو ئەوانی هێندە خۆش بوێ، بەڵام بەشێك لە هۆزە عەرەبەكان بە پاڵنەری دەمارگیریو ئاشوبگێڕی لێیان خستو لە ژێر فەرمانی

---

١ الكامل في التأريخ (٢/٥٨٤).

٢ قادة الفتح الاسلامي في بلاد ماوراء النهر (ص: ١٥٢).

٣ فتوح البلدان (ص: ٥٨٢).

٤ قادة الفتح الاسلامي في بلاد ماوراء النهر (ص: ١٥٢).

٥ الكامل في التأريخ (٢/٦٠٥).

دەرچون[١]. یەکێك لەقسە کەرەکانیان وتی: (سەلم) خراپترین خەیاڵپلاوی کردوە، ئەو پێی وایە ئەو دەبێ لە هەردوك حاڵەتی یەکڕیزیوپەرتەوازەیی یان ئاشتیو ئاشوبدا ئەمیرمان بێ![٢]. ئەمەو خەڵکی (خۆراسان) کاربەڕێوەبەرەکانیان قاودانو دەریان کردن، هەر هۆزە کەوتە ناوچەیەکەوەو باڵی دەسەڵاتی خۆی بەسەردا کێشا، ئاگری ئاشوبو جەنگ هەڵایسا[٣]. براکوژی لە نێو هۆزە عەرەبەکانی ئەوێدا بەرپابوو، موسڵمانەکان یەکتریان بەر شمشێر دەدا. خۆراسان بوو بەچەند ناوچەیەكو هەر ناوچەیەکیش میرو فەرماندەیەکی هەبوو، بزوتنەوەی فتوحات ڕاوەستا، (سەلم ی کوڕی زیاد)یش بەرەو (مەککەی موکەڕەمە)و (عبدالله ی کوڕی زوبێر) بەڕێکەوت[٤].

## شەشەم: فتوحاتی (سند) لە سەردەمی (معاویە)دا:

سوپای ئیسلام لە سەردەمی (معاویە)دا (ڕەزای خوای لێبێ) توانی باڵی دەسەڵاتی خۆی بەسەر ناوچەکانی ئەو دیو ڕوباری (سند)دا بکێشێ، ساڵی ٤٤ك (موهەللەبی کوڕی ئەبی سوفرە) سنوری (سند)ی بەزاندو گەیشتە شاری (بەننە)[٥] و (لاهور) کە هەردوکیان دەکەونە نێوان (مولتان)[٦] و (کابول)، سەرەتای ساڵی ٤٥ك (عبدالله ی کوڕی عامر)ی والی (بەصرە). سوپایەکی چوار هەزاری بەسەرکردایەتی (عبدالله ی کوڕی سواری عوبێد) بەرەو سەر سنوری (سند) نارد، کاتێك (عبدالله) بەخۆی و هێزە هێرشبەرەکەیەوە گەیشتە (مەکران)، ماوەی چوار مانگ لەوێ ئارامی گرتو خۆی بۆ هێرشە چاوەڕوانکراوەکە ساز دەکرد، ئەمجا بەرەو وڵاتی (قیقان)[٧] بەڕێکەوتو، لە ئەنجامدا فەتحی کرد، ئەمەو لە کاتی گەڕانەوەیدا بۆ (شام) (ئەسپێکی قەیقانی)[٨] بەدیاری بۆ (معاویە) هێنابۆوەو بەدەستی خۆی پێشکەشی کرد، جێگەی باسە ڕەسەنی (بەڕازینی قەیقانی) لە تۆرەمەی ئەو جۆرە ئەسپانە

---

١ الكامل في التأريخ (٢/٦٢٢).

٢ فتوح البلدان (ص: ٥٨٢).

٣ قادة الفتح الاسلامي في بلاد ماوراء النهر (ص: ١٥٣).

٤ فتوح البلدان (ص: ٥٨٢)، قادة الفتح الاسلامي في بلاد ماوراء النهر (ص: ١٥٤).

٥ (بەننە): شارێکە لە نزیك (کابول)، معجم البلدان (٢/٥٠٠).

٦ (مۆلتان): شارێکی نزیك (غەزنە)یە لە هیند، خەڵکەکەی موسڵمانە.

٧ (قیقان): وڵاتێکە لە نزیك (تەبەرستان)، معجم البلدان (٤/٤٢٣).

٨ فتوح البلدان (ص: ٤٣٢).

کەوتونەتەوە[١]، بەهەرحاڵ (عبدالله ی کوڕی سوار) لە ساڵی ٤٧ك یداو لە سەرسنورە سەنگەر نشینەکانی (سند) لەلایەن تاقمە تورکێکەوە کوژرا[٢]، ساڵی ٤٨ك (زیادی کوڕی أبی سفیان) ـی والی (بەصرە)ـ (سنان ی کوڕی سەلەمەی کوڕی موحەبیەقی هەزلی) دیاریکرد تا ببێتە والی هەرێمە فەتحکراوەکانی سنوری (سند)، هەر کە (سنان) گەیشتە ئەوێ توانی بەجەنگو زەبرو زەنگ شاری (مەکران) فەتح بکاو بیکاتە پایتەختی خۆیو کارو باری وڵاتی لێوە رێکخست[٣]. بەڵام (سەنان) جگە لە ساڵێك یان دوو ساڵ هێندە لەوێ نەمایەوەو زیاد لێی خستو، (ڕاشیدی کوڕی عەمروی ئەزدی) خستە جێگاکەی، (ڕاشید) هاتە(مەکران)و، ئەمجا لە وڵاتی (قیقان)دا پێشرەوی کردو، سەرکەوتنی بەدەستهێنا، دوایە بەرەو (مید) ڕۆیشتو، هەر لەوێش کوژرا.[٤]

پاش ئەمە (عوبادی کوڕی زیادی کوڕی ئەبی سوفیان) بوو بە والی (سوجستان)، بە سەرکردایەتی سوپایەك چووە نێو دەشتی ڕووباری (سند)ەوەو، پێشدا لە (کیش) گیرسایەوەو، ئەمجا بەرەو (قەندەهار)[٥] بەرێکەوت، لەگەڵ خەڵکەکەی کەوتە جەنگەوەو دوای کوژرانو لە دەستدانی ژمارەیەك موسڵمان توانی تێکیان بشکێنێتو شارەکەیان لێ فەتح بکات،[٦] دواهەمین والی کە لەم وڵاتەدا سەرپەرشتی کاروباری بزوتنەوەی فتوحاتی کرد (منذری کوڕی جارودی عەبدی= أبو الأشعث) بوو، کە لە ساڵی ٦٢ك لە لایەن (عبیدالله ی کوڕی زیادی کوڕی أبی سفیان)ی والی (بصرە)وە پشتیوانی لێکرا، ئەمەو (مونذیر) بە خۆیو سوپاکەیەوە پەلاماری شاری (قوسدار)[٧]ی داو، توانی فەتحی بکات.[٨]

---

١ تأريخ الخليفه (ص: ٢٠٧)، خلافه معاويه بن أبى سفيان (ص: ١٤٢).

٢ تأريخ الخليفه (ص: ٢٠٧)، خلافه معاويه بن أبى سفيان (ص: ١٤٢).

٣ فتوح البلدان (ص: ٤٣٢).

٤ فتوح البلدان (ص: ٤٣٢).

٥ معجم البلدان (٤/٤٠٢).

٦ فتوح البلدان (ص: ٤٣٣).

٧ معجم البلدان (٤/٣٥٣).

٨ فتوح البلدان (ص: ٤٣٣)، خلافة معاوية للعقيل (ص: ١٤٣).

# باسی چوارەم

## ئەو وانەو پەندو سوودە هەرە گرنگانەی لە فتوحاتی معاویە ( ڕەزای خوای لێ بێت ) وەردەگیرێن:

## یەکەم: کاریگەری ئایەت‌و فەرموودەکان لەسەر دەروونی موجاهیدان:

هەمو ئەو ئایەت‌و فەرمودانەی باس لە گەورەیی جیهاد دەکەن کاریگەری تایبەتی خۆیان هەبوو لە سەر دڵودەرونی موجاهیدەکان، خودای دۆست ڕونی کردۆتەوە کەموجاهیدان لە بەرانبەر هەر جموجۆڵ‌و چالاکیەکدا ئەنجامی دەدەن پاداشتیان دەدرێتەوە، خودای بەرز دەفەرموێت: ﴿ مَا كَانَ لِأَهْلِ الْمَدِينَةِ وَمَنْ حَوْلَهُم مِّنَ الْأَعْرَابِ أَن يَتَخَلَّفُوا عَن رَّسُولِ اللَّهِ وَلَا يَرْغَبُوا بِأَنفُسِهِمْ عَن نَّفْسِهِ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ لَا يُصِيبُهُمْ ظَمَأٌ وَلَا نَصَبٌ وَلَا مَخْمَصَةٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا يَطَئُونَ مَوْطِئًا يَغِيظُ الْكُفَّارَ وَلَا يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَّيْلًا إِلَّا كُتِبَ لَهُم بِهِ عَمَلٌ صَالِحٌ ۚ إِنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ ﴿١٢٠﴾ وَلَا يُنفِقُونَ نَفَقَةً صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً وَلَا يَقْطَعُونَ وَادِيًا إِلَّا كُتِبَ لَهُمْ لِيَجْزِيَهُمُ اللَّهُ أَحْسَنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٢١﴾ ﴾.[1]

واتە: دانیشتوانی (مەدینە)و خەڵکانی موسڵمانی دەوروبەریان لە بۆیان دروست نیە بۆ جیهاد خۆیان لەپێغەمبەری خودا دوابخەن‌و فەرمان‌و خواستی دەرونی خۆیان بەسەر فەرمان‌و خواستی دەرونی ئەودا هەڵبژێرن، چونکە ئەمان هەرکات لە ڕێی خودادا توشی هەر کامێك لەمانە تینوایەتی‌وماندو بون‌و برسیایەتی ببن، یان پێ یەکانیان بنێنە وڵاتێك کافران بەهۆیەوە قەڵس بن، یان هەرجارێك دەستیان لە دوژمن وەشاندو بەزاندیانن ئەوا لە بەرانبەردا پاداشتی چاکیان بۆ دەنوسرێ، بێ گومان خودا پاداشتی چاکە کاران هون ناکا هەرکات ماڵی خۆیان ببەخشن چ کەم چ زۆر، یان هەر کاتێك بەدۆڵێکدا تێپەڕین ئەوا — پاداشتی باشیان— بۆ دەنوسرێ، بەخاتری ئەوە خودا بەچەشنێك پاداشتیان بداتەوە کەزۆر لەو کردەوانە چاکتربێ کە ئەنجامی دەدەن.

... فێری ئەوە ببون کە جیهاد کردن لە ئاوەدانکردنەوەی مزگەوتی (حەڕام) و ئاوگێڕان بەسەرحاجیان —ی ماڵی خودادا— خێرترە، خودای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ كَمَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَجَاهَدَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۚ لَا يَسْتَوُونَ عِندَ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ لَا

---

[1] التوبة (١٢٠_١٢١).

يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَهَاجَرُوا۟ وَجَـٰهَدُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ أَعْظَمُ دَرَجَةً عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿٢٠﴾ يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُم بِرَحْمَةٍ مِّنْهُ وَرِضْوَٰنٍ وَجَنَّـٰتٍ لَّهُمْ فِيهَا نَعِيمٌ مُّقِيمٌ ﴿٢١﴾ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٢٢﴾﴾[1].

واتــە: ئــەوە پيــشەی ئــاوگێڕان بەســەر حاجيــانو ئاوەدانكردنــەوەی مزگــەوتی (حــەڕام) بەرابنەر دەكەن بەڕەفتاری كەسێك كە ئيمانی بەخوداو ڕۆژی دوايی هێناوەو جيهادی لە ڕێی خودادا كردووە؟! ئەمانــە بــەلای خــوداوە يەكسان نــين، خــودا خــەڵكی ستــەمكار ڕێنمــايی ناكات، ئەوانەی ئيمانيان هێنــاوەو كۆچيان كــردووەو بەســامانو گيــانو جەستــەيان لــەڕێی خودادا جيهاديان ئەنجامداوە، گەورە ترين پاداشــتيان لــەلای خــودا هەيــەو، ئەوانــە ئەوانــەن كەســەرفرازن، پــەروەردگاريان مــوژدەی بــەزەيی پێداهاتنــەوەو لێ ڕازی بوونيــان و بردنــە بەهەشتێكيان پێ دەدا كــە نازونيعمــەتی نــەبڕاوەی تێدايــەو بــە نــەمریو بــۆ هەميــشە تێيــدا دەمێننەوە، بێگومان خودا جۆرە پاداشتێكی زۆر گەورەی لە لايە.

.... بــەبڕوای ئــەوان ئــەنجامی (جيهــاد) بــە هــەر جۆرێــك بێــت بردنەوەيــەو ســەركەوتنە، خــودای بــەرزو مــەزن دەفــەرموێ: ﴿قُلْ هَلْ تَرَبَّصُونَ بِنَآ إِلَّآ إِحْدَى ٱلْحُسْنَيَيْنِ ۖ وَنَحْنُ نَتَرَبَّصُ بِكُمْ أَن يُصِيبَكُمُ ٱللَّهُ بِعَذَابٍ مِّنْ عِندِهِۦٓ أَوْ بِأَيْدِينَا ۖ فَتَرَبَّصُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُم مُّتَرَبِّصُونَ﴾[2].

واتە پێيان بڵێ: ئايا جگە لە يــەكێك لــە دو– ئاواتــە– چاكەكان چاوەڕێی چ دەكــەن بــۆ ئێمــە؟ – كــە يەكــەميان: ســەركەوتنی ئێمەيــە بەســەرتانداو بەرزكردنــەوەی ئــاڵای (لاإلــه إلاالله)وچەسپاندنی حوكمی خودايە–، دووەميــان: شــەهيدبونمانە لــەم ڕێيــەداو شــادبونمانە بەڕەزامەندی خوداو بەهەشتەكەی؟! ئێمە چاوەڕوانين خودا ئێوە تووشی سزايەك بكا لەلای خۆيەوەو– نغرۆتــان بكــاتو هەڵتانداتــە نێــو ئــاگری دۆزەخــەوە، يــان توشــی ســزاو گــورزی دەستی ئێمەتان بكاتو هەر لەدونيادا شكست بخۆنو توشی كوشــتنو ديلــیو دامــاوی بــبن؟ جا چاوەڕێبن، ئێمەش لەگەڵ ئێوە چاوەڕێين.

بە باوەڕی ئەوان شەهيد لەژيان دانابڕێ، بەڵكو زيندووە، خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ

---

١ سورة التوبة (١٩– ٢٢).

٢ سوری التوبة ٥٢.

وَيَسْتَبْشِرُونَ بِالَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١٧٠﴾ ۞ يَسْتَبْشِرُونَ بِنِعْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ وَفَضْلٍ وَأَنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿١٧١﴾﴾[1].

واته: بەهیچ جورێك گومان مەبە: کە ئەوانەی لەڕێی خودادا کوژراون مردوین بەڵکو زیندوونو، لەلای پەروەردگاریان لە بەهەشت ڕۆزیان پێ دەدرێ، لەبەرانبەر ئەو چاکەو نازو نیعمەتەی خودا پێی داون دڵخۆشنو، موژدە دەدەن بەو هاورێ موجاهیدانەی دوای خۆیان کە هێشتا نەکوژراونو نەچونە ریزی ئەوانەوە: کەلەکاتی شەهیدبونیاندا نە هیچ مەترسیەك رووبان تێ دەکاتو نە دڵتەنگیش دەبن، واتە بۆ ژیانی دوای شەهیدبونیان خۆشحاڵ دەبنو پەرۆشی ژیانی دونیاشیان نابێ، موژدەی چەشنە چاکەو نازو نیعمەتێکی خودا دەدەن – کە نەچاو بینیویەتیو نە گوێ بیستویەتیو نەبەخەیاڵی کەسیشدا هاتووە–،لە ڕاستیدا خودا کرێی ئیمانداران هون ناکا. ئەوان هەست بە بەرزی ئەو ئامانجەیان دەکەن کە لەپێناویدا دەجەنگن، خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿فَلْيُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ يَشْرُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا بِالْآخِرَةِ ۚ وَمَن يُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيُقْتَلْ أَوْ يَغْلِبْ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٧٤﴾ وَمَا لَكُمْ لَا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا ﴿٧٥﴾ الَّذِينَ آمَنُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۖ وَالَّذِينَ كَفَرُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوتِ فَقَاتِلُوا أَوْلِيَاءَ الشَّيْطَانِ ۖ إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفًا ﴿٧٦﴾﴾[2].

واته: دەبا ئەوانەی ژیانو گوزەرانی دنیایان بەژیانی دوارۆژ فرۆشتوه لە ڕێی خودادا جەنگ بکەن، هەرکەسێك لە ڕێی خودادا بکوژرێ یان – بەسەر دوژمندا– زاڵبێ، ئەوا لە مەولا پاداشتێکی گەورەی پێ دەبەخشین – کە بریتی یە لە ڕزگار بون لە دۆزەخو شاد بون بە خۆشییەکانی بەهەشت–، ئەوە لەبەر چی لە ڕێی خودا– و بەرز کردنەوەی ئاڵاکەیو چەسپاندنی شەریعەتەکەی–و ڕزگارکردنی – چەوساوەکان جەنگ ناکەن؟!، ئەو چەوساوانەی کەلەو پیاوو ژنو منداڵانە پێکهاتون، کە هانایان بۆ پەروەردگار هێناوەو دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان: لەو شارەمان دەرباز بکە کە خەڵکەکەی بێباوەڕو ستەمکارن، لەلای خۆتەوە پشتیوانو سەر پەرشتکارێکمان بۆ بڕیار بدەو، سەر خەرێکمان بۆ بنێرە. ئا ئەوانەی ئیمانیان هێناوە لەڕێی خودادا جەنگ دەکەن، ئەوانەش کە بێباوەڕن لە ڕێی تاغوتدا

---

١ سورة ال عمران (١٦٩– ١٧١).

٢ سورة النساء ٧٤–٧٦.

جەنگ دەکەن، جا کەواتە: لە گەڵ دۆست‌و نۆکەرانی شەیتان بجەنگێن، بێگومان تاکتیکی ی شەیتان لاوازە.

پێغەمبەری خوداش (ﷺ) گەورەیی جیهادی بۆ موسڵمانان ڕوونکردۆتەوە، بەچەشنێك فەرمودەکانی هەست‌و سۆزی خرۆشاندبون‌و کانی وزەو تواناکانی تەقاندبوونەوە، لەو فەرمووده پیرۆزانە:

أبو سعیدی خودری خوا لێی ڕازی بێت وتی: گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! کێ لە هەمو کەس چاکو شکۆدارترە؟ جا پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموی: (مؤمن یجاهد بنفسه وماله)[1]. واتە: ئیمانداریك بەخۆی‌و سامانیەوە جیهاد بکا، پێغەمبەری خودا (ﷺ) پلەو پایەی موجاهیدانی ڕونکرۆتەوەو، دەفەرمویٚ: (إن في الجنة مائة درجة أعدها الله للمجاهدين في سبيل الله، ما بين الدرجتين كما بين السماء والأرض، فإذا سألتم الله فاسألوه الفردوس، فإنه أوسط الجنة وأعلاها) [2] واتە: سەد پلە لە بەهەشت هەیە کە خودا هەمویانی بۆ موجاهیدانی ڕێی خۆی ئامادە کردوە، ماوەی نێوانی هەردو پلەیەك وەك ماوەی نێوان ئاسمان‌و زەوی یە جاکە لە خودا پاڕانەوە داوای (فیردەوس)ی لیٚ بکەن، چونکە (فیردەوس) هەم ناوەڕاستی بەهەشتەو هەم باریٚ سەرەوەی بەهەشتە. (پێغەمبەرمان) (ﷺ) گەورەیی‌و ڕێزو حورمەتی شەهیدانی ڕوون کردۆتەوەو دەفەرموێت: (إنتدب الله لمن خرج في سبيله، لا يخرجه إلا إيمان بي، وتصديق برسلي أن أرجعه بما نال من أجرأو عنيمة أو أدخله الجنة، ولو لا أن أشق على أمتي ما قعدت خلف سرية، ولوددت أني أقتل في سبيلالله ثم أحيا، ثم أقتل ثم أحيا ، ثم أقتل) [3] واتە: خودا دەستە بەرو کەفالەتی ئەوکەسەی کردوە کە لەڕێی ئەو چۆتە دەرەوەو -فەرمویەتی-: تەنها هۆکاری ئیمان بەمن‌و بەڕاستدانانی پێغەمبەرەکانم بە دەری نابیٚ، ئەوا من کەفیلم- بەو دەسکەوتەوە دەستگیری بوە لە پاداشت‌و غەنیمەت، بیگێڕمەوە نێو ماڵ‌و خێزان‌و کەس‌و کاری خۆی- یان-کەکوژرا- بیخەمە نێو بەهەشتەوە، -ئەمجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ئەگەر نەدەبوو بەمایەی ناڕەحەتی ئوممەتم ئەوا لە هیچ سریە سەربازێکی غەزاکەر دوانەدەکەوتم‌و دانەدەنیشتم‌و، حەزم دەکرد، لەڕێی خودادا

١ البخاري، رقم (٢٧٨٦).
٢ البخاري، رقم (٢٧٩٠).
٣ مسلم، رقم (١٤٩٧/٣).

بکوژرامایەو، ئەمجا زیندو کرابا مایەوەو، دیسان بکوژرابامایە، ئـەمجا زینـدو کرابامایـەوەو، دیسان بکوژرابامایەوە.

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (ماأحد يدخل الجنـة يحـب أن يرجـع إلى الـدنيا ولـه مـا على الأرض من شيءٍ إلا الشهيد، يتمنى أن يرجع الى الـدنيا فيقتـل عـشر مـرات لمـا يـرى مـن الكرامة)[1]. واتە: بێجگە لە شەهید کەسێك نیە بچێتە بەهەشتەوەو حەزبکا بۆ دنیا بگەڕێتـەوە ئەگەر چی ئەوەی لە زەویش بەجێ مابێ هی ئەو بوبێ، شەهید بـەهۆی بینینـی هـەموو ئـەو ڕێزو بەخششەی — لـە بەرانبـەر شـەهیدبوونەکەیدا— پێـی دراوە—ئـاوات دەخـوازێ بۆ دنیـا بگەڕێتەوەو دەجاری تر شەهید بکرێتەوە. یەکەمین نەوەی ئیسلام(هاوەڵان)و ئەوانەش پـێ بەپێی ئـەوان هـەنگاویان هـەڵگرتبوو، بـەهۆی ئـەم ئایـەتو فەرمودانـەوە کاریـان تێکرابـوو، هەرچەندە گەورە هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێـت لـەو سـەردەمەدا تەمـەنیان بـەرەو سـەریش ڕۆیـشتبوو بـەڵام لەجـەنگو غەزاکانـدا پێـشەنگو بەشـداربوون، خـەڵك بـەزەییان پێـدا دەهاتنەوەو بەبەڵگەی ئەوە عوزریان بەدەستەوەیە ئامۆژگاریان دەکردنو پێیان دەگوتن لە ماڵەوەدانیشنو پـشوو بـدەن، لەوەڵامـدا دەیـانوت: کـە (سـوڕەتی (التوبـه) ڕێیـان پـێ نـادا دانیشن)، لەڕاستیدا دەترسان ئەگەر لە غەزا دواکەون توشی دەردی دوڕویی (نفاق) ببن[2]. بە هەمان جۆر (زاناو شەرعزانو زاهید)ان ڕۆڵێکی گەورەیان دەگێڕا لـە پـەروەردەکردنی خـەڵك بەم ئایەتو فەرمودانە: گەورە هاوەڵانی وەك (أبو أيوبي أنـصاريو عبـدالله ی کـوڕی عمـر)و کەسانێکیش لە تابیعیەکانی وەك (أبو موسلم ی خەولانی) لەڕیزی ئەو مامۆستایانە بـوون و، پێیان وابوو جیهاد کردن لە ڕێی خودادا پێویستیەکی هەرە گەورەیە بـۆ مانـەوەی ئوممـەتی ئیسلام. بەخاتری ئەمە ئـەم فـەرزەیان بـەر پـاکردو، لـە فتوحـاتی وڵاتـانی( شـامو بـاکوری ئەفریقیاو خۆراسانو سوجستانو سند)دا بەشداریان کردو، لە ئـەنجامی بەجێگەیانـدنی ئـەم فـەرزەدا بەرهـەمێکی زۆرو زەوەنـد بەدەسـتهات، وەك: تێگەیانـدنو پێگەیانـدنی ئوممـەتی ئیـسلامی تـا سـەرکردایەتی مرۆڤایـەتی بکـا، نەهێـشتنی دڕیو دەسـەڵاتی بێبـاوەڕانو، زەبونکردنیـانو، تـرسو خـۆف خـستنە نێـو دڵیانـەوە، دەرخـستنی ڕاسـتو دروسـتی بانگەوازەکەیان، ئەمە وای لە خەڵك کرد پۆل پۆل بێنە نێو دینـی خـوداوەو ئاسـتی ژمـارەی موسـڵمانان بـەرەو بـاڵا بـچێتو دەسـەڵاتیان زیـاد بکـاتو ژمـارەی بێبـاوەڕانیش دابـەزێتو

---

١ البخاري، رقم (٢٨١٧).

٢ الجهاد في سبيل الله، للقادري (١/١٤٥).

زەبون‌و گەردنکەچ بن‌و، موسڵمانان لەدژی دوژمنەکانیان یەك ڕیزو یەکگرتووبن‌و خەڵکیان لەژێر ڕوناکی ئیسلام‌و سایەی دادپەروەری‌و ڕەحمەتەکەیدا خەندان‌و شادان کرد[1].

## دووەم: فتوحاتی سەردەمی( معاویە ) و ژمارەیەك دەستوری خودا.

توێژەر لە میانەی تاوو توێکردنی لاپەڕەکانی فتوحاتی سەردەمی (معاویە) دا ژمارەیەك دەستوری نەگۆڕی خودای دێنە بەر چاو کە بۆ ژیانی کۆمەڵگاو گەل‌و دەوڵەتان ڕەچاوی کردوون، لەو دەستورو ڕێوشوێنانە:-

١- دەستوری خودا لەبەرانبەر کۆکبون‌و یەکگرتن:

پاش هەڵگەڕانەوەکەی ڕۆژگاری (أبوبکر) خوا لێی ڕازی بێت‌و، ئەو ئاشوبەی سەری کێشا بۆ شەهیدکرانی (عثمان) خوا لێی ڕازی بێت، گەورەترین ئاستەنگ هاتە سەر ڕێی بزوتنەوەی (فتوحات)، شەهیدکرانی (عثمان) خوا لێی ڕازی بێت سەری کێشا بۆ ڕاوەستانی جیهادو، ڕاست بونەوەی موسڵمانان بە شمشێرەکانیان لە ڕوی یەکتریدا، -ئەگەر خودا بەهۆی صوڵحەکەی (حەسەنی کوڕی عەلی) لە گەڵ (معاویە)دا خودا لەهەمویان ڕازی بێت (سۆزو بە زەیی خۆی نەنواندبایە) خەریك بوو تەواوی ئوممەتی ئیسلام بەر لافاوی ئەو ئاشوبە کەوتبایە، سەرچاوەکانی مێژوو بەو دەقانە پڕن کە دەری دەخەن ئاشوبەکە چەندە کاریگەری هەبووە لەسەر (بزوتنەوەی جیهاد)و چۆناوچۆن پەکی خستووە[2]، لە ڕستەی ئەو دەقانە:-

- لە (حسن ی کوڕی علی) خوا لێی ڕازی بێت گێڕدراوەتەوە، کە وتویەتی: پێم چاك بوو بەرەو (مەدینە) بچم‌و تێیدا نیشتەجێ ببم‌و نێوانی (معاویە)و ئەم بابەت‌و باسوخواسە چۆڵ بکەم، لە ڕاستیدا ئاشوبەکە درێژەی کێشاو زۆری خایاند، خوێنێکی زۆری تێدا ڕژاو سیلەی ڕەحمی تێدا پسێنراو، ڕێگاو بانەکان گیران، سەنگەر نشینی سەر سنورەکان‌و جەنگو جیهادی - ڕێی خودا-ی تێدا پەك خرا.[3]

- (أبوزرعە)ی دیمەشقی بە سەنەدی خۆی گێڕاویەتیەوەو، دەڵێ: لە ماوەی نێوان کوژرانی (عثمان)و دروستبونی ئاشوبو ناکۆکی خەڵکەوە تا سەردەمی (معاویە)و کۆکبونی خەڵك لە سەر ئەو نە زستانەغەزایەك نە هاوینەغەزایەك لە دژی دوژمنان ئەنجام نەدرا[4].

---

١ الجهاد في سبيل الله (٢/٤١١ـ٤٨٢).
٢ مرويات خلافة معاوية (ص: ٣١٠).
٣ الطبقات، تحقيق السُلمي (١/٣٣١).
٤ مرويات خلافة معاوية (ص: ٣١٠).

– وتەی (أبوبكر المالكی): ئاشوبەکە ڕویدا... (عثمان) خوا لێی ڕازی بێت شەهید کرا، (علی) خوالێی ڕازی بێت کرا بە (خەلیفە)، (ئەفریقیا) تا سەردەمی خیلافەتی (معاویە) خوا لێی ڕازی بێت لە سەر بارو دۆخی پێشدای مایەوە[1]. بەڵام دوابەدوای سوڵحەکەو دەرکەوتنی دەرەنجامەکانی لە کۆکبونو یەکریزیو یەکگرتنو، بزوتنەوەی فتوحات گەڕایەوە بۆ بارودۆخی پێشدایو، لە سێ قۆڵەوە حەڕەکەی کرد. یەکگرتنو کۆبونەوە لەسەر قورئانو سوننەت یەکێکە لە مەبەستە هەرە پیرۆزەکانی شەریعەتو، گرنگترین هۆکاری چەسپاندنی دینی خوداو درێژە پێدانی بزوتنەوەی فتوحاتە، دەستگرتن بەهۆکارەکان لە پێناو یەکگرتنی دڵی موسڵمانانو پێکەوە جۆشدانو یەکخستنی ڕیزەکانیان بە گەورەترین جیهاد دادەنرێ، چونکە ئەم هەنگاوە بۆ بەهێز کردنی دەسەڵاتی موسوڵمانانو بەر پاکردنی دەوڵەتەکەیانو حوکمگێڕان بە شەریعەتی پەروەردگاریان یەجگار گرنگو بە بایەخە[2]. شتێکی حاشاهەڵنەگرە کە دەرچونو وەستانی بزوتنەوەی فتوحات پەیوەستە بە وابەستەبوون بە سوننەتی ڕێککەوتنو یەکگرتنو کۆبونەوەوە، تورڕدانی پەرتەوازەییو ناکۆکیوناتەبایی، خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْۚ﴾[3].
واتە: بە دەستە جەمعی دەست بە ڕێسمانی خوداوە بگرنو پەرتەوازە مەبن.

٢– سوننەتی دەستگرتن بە هۆکارەکانەوە:

خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ وَمِن رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ تُرۡهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمۡ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمۡ لَا تَعۡلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعۡلَمُهُمۡۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيۡءٖ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيۡكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تُظۡلَمُونَ ٦٠﴾[4]. واتە: ئەوەندەی دەتوانن هێزیان بۆ سازکەن، با ڕێشمەی ئەسپیش لە بیر نەچێ، بەم هێزو پێزە دوژمنی خوداو دوژمنی خۆتان دەترسێنن، بێ لەمانیش خەڵکانێکی تریان پێ چاوترساو دەکەن کە ئێوە پێیان نازاننو نایانناسن، خودا دەیانناسێ، هەچ شتێك لە ڕێی خودا ببەخشن، پاداشتی پڕاو پڕتان دەدرێتەوە، ئێوە قەت ستەمتان لێ ناکرێ.

---

١ ریاض النفوس (١/٢٧).
٢ خامس الخلفاء الراشدين (الحسن بن علي)، (ص: ٣٥٩).
٣ سورة ال عمرا ن (١٠٣).
٤ سورة الأنفال (٦٠).

(معاویە) خوای لێی ڕازی بێت کاری بەم ئایەتە کردوو هانی والیەکانی دا کاری پێ بکەن، دەردەکەوێ کە ئەو دەستی بەسوننەتی (دەستگرتن بە هۆکارەکانەوە) گرتـوەو لـە میانـەی ئەنجامدانی ئەم کارە گرنگانەیدا ئەمـەی سـەلماندوە: بایـەخی بـە دامەزرانـدنی کەشـتیڕانی دەریـایی‌و کەشـەپێدانی‌و، بـە هێزکردنـی سـوپاو، نەهێـشتنی ئاشـوبگەلی نێوخـۆو، پشتیوانیکردنی هێزە سەنگەر نشینەکانی سەرسنورو، دانانی نەخشەی ستراتیژی دەوڵـەت لە سیاسەتی نێـو خـۆو دەرەوەیـداو، پـەیڕەو کردنـی تـاکتیکێکی سـەربازی لـە سیـستەمی (سەربازگەو، سەنگەرنشینی، سنور پارێزی، هاوینە هێرش‌و زسـتانە هێـرش‌و، دروسـتکردنی قەڵاو شورەو، خۆ پڕچەککردن)دەداو، ڕاکێشان‌و ڕامکردنی هـۆزو تیرەکـان بـە خـاتری بـڵاو کردنـەوەی ئیـسلام‌و فراوانکردنـی بازنـەی فتوحـات‌و وەسـتانەوە لـەڕوی بزوتنـەوە یـاخی بووەکان. پاش ڕەوینەوەی ترس‌و پـەلاماری سـەربازی لەلایـەن فارسـەکانەوە دەیـان هـەزار خێزانی (عەرەب)ی لە بەشی خۆرهەڵاتی دەوڵەت بە تایبەت لە (خۆراسان) نیشتە جێ کـرد، ئەم سیاسەتەی سەری گرت‌و لەم قۆڵەوە – واتـە قـۆڵی خۆرهـەڵات– بەرهـەمی خـۆی دا بـە دەستەوە[1].

٣– سوننەتی بەگری لە خۆکردن:

خـودای بـەرز دەفـەرموێ: ﴿وَلَوۡلَا دَفۡعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعۡضَهُم بِبَعۡضٖ لَّفَسَدَتِ ٱلۡأَرۡضُ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾[2]. واتە: ئەگەر خودا بەهۆی جـەنگ‌و جیهـادی چاکەکارانی نێو خەڵکەوە بەری بە ئاشـوب‌و هـەرای خراپـەکاران نەگرتبایـە، ئـەوا زەمـین–و ژیـان وگـوزەرانی سـەری– تێکدەچـوو، بـەڵام خـودا چـاکەو نـازو نیعمـەتی زۆری بـە سـەر جیهانیانەوە هەیە. ئـەم (سـوننەتە) بەشـێوەیەکی گشتی لـە بزوتنـەوەی فتوحاتـدا بـەدی هـاتبوو، سـوننەتی (بـەرگری لـە خـۆکرتن) یەکێکـە لـە ڕیـزی سـوننەت‌و ڕێـو شـوێنە هـەرە بایەخدارەکانی خودای بەرزو مەزن کە بـۆ بوونـەوەرو دروسـتکراوەکانی خـۆی دانـاون‌و، لـە پێـشەوەی هـەموو ئـەو سوننەتانەشـەوەیە کـە پەیوەنـدی ڕاسـتەو خۆیـان بـە جێگیربـونی دەسەڵاتی ئوممەتی ئیسلامەوە هەبێ، موسـڵمانانی پێـشین بەتایبـەتی نـەوەی یەکـەم، لـەم (سوننەتە) حاڵی ببون‌و چاکیان دەزانی کە: هەق‌و ڕاستی حەوجێی بە عەزیمەتگەلێك هەیـە ڕاوەسـتاوی بکـات‌و، هێـزو بـازو گـەلێك هەیـە بـەرەو پێـشەوەی بـەرێ‌و، وڵاتێـك هەیـە لـە

---

١ العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ١١٩).

٢ سورة البقرة (٢٥١).

باوەشیان بگرێتو، دەمار گەلێك هەیە بەهۆیانەوە خۆی پێ ببەستێتەوە، ڕاستیەکەی هەق پێویستی بە هەوڵو تەقالای مرۆڤ هەیە، چونکە ئەمە سوننەتێکی خودایە لە ژیانی دونیاداو تێپەریوەو دەبێ هەر بەم شێوەیە بەرگری لێ بکرێ[1].

٤- سوننەتی تاقی کردنەوە:

خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُم ۖ مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلْزِلُوا۟ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِ ۗ أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ (٢١٤)﴾[2]. واتە: ئای ئای ئەوە پێتان وابو- کە بەبێ تاقی کردنەوەو توشبون بە هیچ گێرەو کێشەیەك- دەچنە نێو بەهەشتەوە؟!، لە حاڵێکدا کە هێشتا وێنەی ئەو نەتەوانەی پێش خۆتان بەسەر نەهاتووە؟!، ئەوان جۆرەها ناگوزوریو نارەحەتیو بەڵاو موسیبەت بەرۆکی گرتنو، ڕاتەکێنران، بە چەشنێك تا کار بەوە گەیشت کە پێغەمبەرەکەیانو ئەوانەش کە ئیمانیان هێنابووو لە گەڵیدابوون، بڵێن: کەی سەرکەوتنی خودا- دەگاتە جێ-؟. هۆشیار بن: کە سەرکەوتنی خودا نزیکە. موسڵمانەکان لە میانەی گەمارۆی سەر (قوستەنتینیە)دا، توشی نارەحەتیو ڕاتەکانی توند هاتنو خەڵکانێکی زۆریان ڕوبەڕوی کوشتن بونەوە، بەهەمان جۆر لە میانەی فتوحاتی (باکوری ئەفریقیا)شدا بەتوندی تاقی کرانەوەو ژمارەیەك گەورە سەرکردەی وەك (عوقبەی کوڕی نافیع)و (أبو المهاجری کوڕی دینار)یان لێ شەهید کران، ئەمە سوننەتێکی خودایەو بۆ تەواوی بیرو باوەڕو بانگەوازەکان ڕەچاوی کردووەو، ئیتر دەبێ گیانو سامان زیانیان پێ بگاتو خۆڕاگریو عەزیمەتیشی بۆ ساز بکرێ[3].

٥- سوننەتی خودا سەبارەت بە ستەمو ستەمکاران:

خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْقُرَىٰ نَقُصُّهُۥ عَلَيْكَ ۖ مِنْهَا قَآئِمٌ وَحَصِيدٌ (١٠٠) وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ۖ فَمَآ أَغْنَتْ عَنْهُمْ ءَالِهَتُهُمُ ٱلَّتِى يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ لَّمَّا جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ ۖ وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ (١٠١) وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَٰلِمَةٌ ۚ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ (١٠٢)﴾[4]. واتە: ئائەوە بەشێکە لە هەواڵی شارو دێهاتەکان -ی پێش ئێوە- بۆت دەگێڕینەوە، هەیانە

---

١ لقاء المؤمنين، عدنان النحوي (٢/١١٧).

٢ سورة البقرة (٢١٤).

٣ فقه النصر والتمكين للصلابي (ص: ٤٥٦).

٤ سورة هود (١٠٠-١٠٢).

شوێنەواری شارەکەی بەڕاوەستاوی ماوەتەوەو دانیشتوانەکەی لە نێو براوە، هەشیانە بەدانیشتوانەکەیەوە وەك پوشو پەڵاش هەپڕون بە هەپڕون بووەو شوێنەواری دیار نەماوە، ئێمە بەم لەنێو بردنانەیان –ستەممان لێ نەکردن، بەڵکو خۆیان– بەهۆی لادانیان لە ڕاستە شەقامی دین– ستەمیان لە خۆیان کرد، کاتێك فەرمانی پەروەردگارت بۆ لە نێوچونیان هات بتەکانیان – کە جگە لە خودا دەیانپەرستن و هیچ سودێکیان پێ نەگەیاندن– و بەهانایانەوە نەهاتن، تەنها بونە مایەی زیاتر زیانپێگەیشتنو لە نێو چونیان، ئیتر گرتنی پەروەردگارت بەم شێوەیەیە، هەرکات ئاوایيەك ستەم کاربوو بەم شێوازە دەیگرێ، لە ڕاستیدا گرتنی پەروەردگار یەجگار بە ئێشو ئازارو توندە.

سوننەتی خودا بۆ لە بەینبردنی نەتەوە ستەمکارەکان بەرنامە داڕێژراوو جێبەجێ کراوە، –تەماشاکەن (دەوڵەتی فارسی) بەکەیفی خۆی ستەمی لە خەڵکی ڕەشوڕوتی وڵاتەکەی دەکردو بەتەواوەتی لە بەرنامەی خودا یاخی ببوو، ئیدی سوننەتی (گرتنی خودا)ی بەسەردا چەسپاو، خودا سوپای ئیسلامی بەسەردا زاڵ کردو بەیەکجاری لە نێوی بردو ڕایماڵی[1]. قەڵەمڕەوی (دەوڵەتی بێزەنتی)یش لە (شامو مصر) بەم جۆرە بوو و، لە بەشی باکوری (ئەفریقیا) شدا لەقە لەقی پێخراو، لە سەردەمی (ولیدی کوڕی عبداللمك)دا بە ڕەگو ریشەوە دەرهێنراو تاوڵی ڕەشی پێچرایەوە..

٦– سوننەتی خودا سەبارەت بە خۆشگوزەرانان:

خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَآ أَرَدۡنَآ أَن نُّهۡلِكَ قَرۡيَةً أَمَرۡنَا مُتۡرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيۡهَا ٱلۡقَوۡلُ فَدَمَّرۡنَٰهَا تَدۡمِيرٗا ﴿١٦﴾ ﴾[2]. (آلوسی) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێ: واتە: ئەگەر کاتی لە نێوبرانی – ئاوایيەك– نزیك بۆوە، فەرمانمان بە (خۆشگوزەران)ە کانی –واتە دەوڵەمەندو دەسەڵاتدارو پاشاکانیان– دەکرد: فەرمانبەرداری– بۆ خوداو پێغەمبەرەکەیو شەرع– ئەنجام بدەن، جا لەوێدا خراپەیان ئەنجامداو لایاندا، جابڕیاری سزادان– بۆ ئەو شارە دێیە– چەسپاو لە نێوی برد، لێرەدا خودا بەتەنهابە(خۆشگوزەران)ەکانی ناو هێنان لە گەڵ ئەوەدا کە فەرمانەکە ڕووی لە هەمولایەك بوو، چونکە ئەوان پێشەوایانی فیسقو فەسادو سەرکردە گەلی بەرەی گومرایی بوونو، ئەوەی بەسەر ئەوان دا هاتبوو بەسەر پاشکۆو شوێنکەوتوەکانیشیاندا هاتبوو، جا کەوابێ ئاڕاستە کرانی فەرمانەکە بۆ ئەوان زیاتر داکۆکی

---

١ السنن الالهية في الأمم والجماعات والافراد (ص: ٢١٩_٢٢١).

٢ سورة الإسراء (١٦).

لەسەرە[١]. بەم چەشنە ئەم (سوننەتە) لە وڵاتی (فارس)–واتە ئێراندا– سەرۆك‌و پاشا فارسەکانی جەب نەداو. لە وڵاتانی (شام‌و مصرو باکوری ئەفریقیا) شدا سەرکردە ڕۆمەکانی وەبەر خۆدان‌و لە نێوی بردن .

٧– سوننەتی خودا لە بەرانبەر سەرکەشی‌و سەرکەشیکاراندا:

خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلۡمِرۡصَادِ ﴿١٤﴾﴾[٢]. واتە: پەروەردگارت لە بۆسەدایە، ئایەتەکە بەڕەهایی هەڕەشەیەکە بۆسەر سەرکەشیکاران، گوتراویشە: هەڕەشەیە بۆ سەرئەوان‌و خەڵکانی تریش[٣]. لە تەفسیری (القرطبي)یدا ئاوا ئاهاتووە: واتە خودا بۆ هەموو مرۆڤێك لە بۆسەدایە تا بەگوێرەی کردەوەکانی پاداشتی بداتەوە، یان سزای بدا[٤]. لە وتەی ڕاڤە کەرانی قورئان سەبارەت بە ئایەتەکانی برگەی پێشدا کە باسمانکردن دەردەکەوێ: کە (سوننەتی خودا) لە بەرانبەر سزادان‌و ڕیسواکردنی سەرکەشیکاران لە دونیادا جێبە جێ کراوەو، ئەوەی بەسەر سەرکەشیکارانی پێشوشدا هاتووە لە مەولاش بەسەر سەرکەشیکارانی ئیمڕۆو سبەینێدا دێت‌و کەسیان ناتوانێ لێی دەرباز ببێ[٥]. تەنها کەسانێك پەند لەم سوننەتە و (سزادانی سەرکەشیکاران) وەردەگرن کە لە خودای بەرزو مەزن دەترسێن‌و، سڵ لە سزاکەی دەکەنەوەو، دەزانن کە: سوننەتەکانی خودا چەند قانونێکی چەسپاوو نەگۆڕن‌و کەس فەرامۆش ناکەن، خودای بەرز سەبارەت بەو کەسانە کە پەند لە سوننەتەکانی، بە تایبەتی سوننەتی (سزادنی سەرکەشیکاران) وەردەگرن، دوای ئەوەی کەباسی فیرعەون‌و ئەو وەیشومەو بەدبەختی‌و پاشە ڕۆژە خراپەی بەسەریدا هات: دەفەرموێ: ﴿فَأَخَذَهُ ٱللَّهُ نَكَالَ ٱلۡأٓخِرَةِ وَٱلۡأُولَىٰٓ ﴿٢٥﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبۡرَةٗ لِّمَن يَخۡشَىٰٓ ﴿٢٦﴾﴾[٦]. واتە: جاخودا گرتی‌و تۆڵەی دونیاو قیامەتی لێ کردەوە، بەڕاستی لەم بەسەرهاتەدا پەندو ئامۆژگاری بۆ کەسێك هەیە کە بترسێ، ئیدی سەرکەش‌و یاخیانی سەرۆکانی فارس‌و سەرۆکانی ڕۆم لە (مصروشام)دا ئەم سوننەتەی خودایان بەسەرەوە جێبەجێ کرا.

---

١ تفسير الألوسي (١٥/٤٢).

٢ سورة الفجر (١٤).

٣ السنن الالهية (ص: ١٩٣).

٤ تفسير القرطبين نقلا عن السنن الالهية (ص: ١٩٣).

٥ السنن الالهية (ص: ١٩٤).

٦ سورة النازعات ٢٥–٢٦).

٨- سوننەتی پلەپلەیی:

فتوحاتی ئیسلامی بەپێی (سوننەتی پلەپلەیی) بەڕێوە دەچوو، گەمارۆدانی یەکەمو دووەمی قوستەنتینیە دوو قۆناغی بەرایی بوون بۆ فەتحکردنی ئەو شارە لە سەر دەمی (محمد الفاتح)ی سوڵتانی عوسمانیدا. هەموو ئەو چالاکیانەی موسڵمانەکان پێش (محمد فاتح)لە دژی دەوڵەتی (بنێزەتی) ئەنجامیان دان، قادرمەیەکیان پێکهێناو لە ئەنجامداو لە سەردەمی عوسمانیەکاندا پێی گەیشتنە لوتکەی سەرکەوتنو قوستەنتینیەیان پێ فەتح کرد.

٩- سوننەتی خودا لە بەرانبەر گوناهو تاوانەکاندا:

خودای بەرز دەفەرمێ: ﴿أَلَمْ يَرَوْا كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ مَا لَمْ نُمَكِّن لَّكُمْ وَأَرْسَلْنَا السَّمَاءَ عَلَيْهِم مِّدْرَارًا وَجَعَلْنَا الْأَنْهَارَ تَجْرِي مِن تَحْتِهِمْ فَأَهْلَكْنَاهُم بِذُنُوبِهِمْ وَأَنشَأْنَا مِن بَعْدِهِمْ قَرْنًا آخَرِينَ ﴿٦﴾﴾[1]. واتە: ئەوە نابینن کە چەندین نەتەوەمان لە پێش ئەماندا لە نێو بردن، دەسەڵاتێکی وامان پێدابون لە سەرزەویدا کە نەمانداوە بەئێوە، بارانمان لە ئاسمانەوە بە خوڕزەم بۆ دەباراندن، ڕوباری وامان بۆ دروستکردبون کە بەژێر کۆشکەکانی ئەواندا دەڕۆیشتن، جا بەهۆی گوناهو تاوانەکانیانەوە لە نێومان بردنو لە دوای ئەوان خەڵکانێکی ترمان دانایەوە. خودای بەرز دەسەڵاتی نەتەوەی (فارس)ی لە ئێرانو دەسەڵاتی (ڕۆم)ی لە (مصرو شام) بە هۆی هەمووئەو تاوانە زۆروگەورانەوە لە نێو برد کە ئەنجامیان دەدان، لەم ئایەتەدا ڕاستیەکی نەگۆڕو سوننەتێکی سابت هەیە کە: گوناهو تاوانەکان خاوەنەکانیان لە نێو دەبەنو، خودای مەزن گوناهباران بە هۆی گوناهە کانیانەوە دەفەوتێنێ[2]. کاتێك ئوممەتی ئیسلام مەرجەکانی خۆڕاگریو حوکمڕانی تێدا هاتنە جێو کاری بە سوننەتەکانی کردوو و دەستی بە هۆکارەکانەوە گرتو ئامانجەکانی پێکان، لەو دەمەدا خودای بەرزو مەزن ئەو ئوممەتەی بەسەر هەردوك ئوممەتی فارسو ڕۆمدا زاڵ کرد.

١٠- سوننەتی گۆڕینی خود (نەفس):

خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾[3]. واتە: لە ڕاستیدا خودا بارو دۆخی هیچ نەتەوەیەك – لە ناخۆشیەوە بۆ خۆشیو لە خراپەوە بۆ چاکە – ناگۆڕێ تا یەك یەکی ئەو نەتەوەیە گۆڕانکاری بەسەر خۆیاندا – لە خراپەوە بۆ

---

١ سورة الأنعام (٦).

٢ السنن الالهية (ص: ٢١٠).

٣ سورة الرعد (١١).

چاكە نەهێنیٚ، هاوەڵە بەڕێزەكان– خودا لێیان ڕازی بێتو– تابیعیەكان –ڕەحمەتی خوایان لیٚ بێت– لە كاتو ساتەكانی فتوحاتی (شامو مصرو باكوری ئەفریقیا)و وڵاتانی خۆرهەڵاتداو لە میانەی هەڵسوكەوت نواندنیان لە بەرانبەر گەلانی ئەو وڵاتانەدا (كە دەیان ویست بێنە نێو دینی خوداوە) كاریان بەم سوننەتە ڕەبانیە كردولە سەر كتێبی خوداو ڕێوشوێنی پێغەمبەرەكەی (ﷺ) دەستیان بە پەروەردەكردنی ئەوان كردو چرای بەشۆقی بیرو باوەڕی ڕاستو دروستو بۆچوونی ساغو سەلیمیان لە تاقی دڵو دەرونو مێشكیاندا هەڵكردو وانەی ڕەوشتی بەرزیان فێركردن.

## سێیەم: ( معاویە ) خوای لێی ڕازی بێت و نەخشە كێشانی ستراتیژی ئەو بۆ فتوحات:-

فتوحات لە سەردەمی معاویەدا بە گوێرەی نەخشەیەكی پڕ وردەكاریو تۆكمەو دامەزراو بەڕێوە دەچوو، سیاسەتی ئەو لە فتوحاتدا بەم چەشنەبوو:

١– سیاسەتی لە بەرانبەر (ڕوم)دا:

ئەم هەنگاوانەی گرتبوونەبەر:

أ– پێدا گیری لەسەر چالاكیەكانی هاوینە هێرشو زستانەهێرش بە خاتری بەدەستهێنانی چەند ئامانجێك، لەوانە: چۆڕوبڕكردنی تەڕایی هێزو پێزی (ڕوم)و، سەندنی جڵەوی دەستپێشخەری هێرش لە (ڕۆم)، بە چەشنێك بكەونە حاڵەتی بەرگریەكی بەردەوامەوە[1].

ناچاركردنی (ڕۆم) تاهێزەكانیان دابەش بكەنو ئیتر لە تواناياندا نەبیٚ هێرشێكی بە هێزی توندی یەكلاكەرەوە لە دژی دەوڵەتی ئیسلامی ئەنجام بدەن[2].

ب– پەلاماردانی (ڕۆم) لە نێو جەرگەی ماڵەكانیانداو گەمارۆدانی پایتەختەكەیان، بەمە بەرەبەرە لایەنی دەروونییان بەرەو لاوازیو ڕوخان دەچێتو، ترسو تۆقان هەموو هەناویان داگیر دەكات.

ج– كزكردنی هێزو پێزی دەسەڵاتی دەریایی ڕۆم لە ڕێی فەتحكردنی دورگە هەڵكەوتووەكانی نێو دەریای شام[3] كەئەمەش لە ئەنجامدا سەردەكێشیٚ بۆ بێبەش كرانی كەشتیەكانی ڕۆم لە بنكە كەنارە دەریایی یە گرنگو بە بایەخەكانی.

---

١ فن الحرب الاسلامي بسام العباسي (٢٣٣/١).

٢ المصدر السابق (٢٣٣/١).

٣ المصدر السابق (٢١١/١).

٢- سیاسەتی (معاویە) لە بەرەی (باکوری ئەفریقیا)دا:

أ- (معاویە) ڕەزای خوای لیٚ بێت بایەخێکی تایبەتی بە بەرەی (مەغریب)دا، بەجۆرێك کارو چالاکیو فەرمانەکانی ئەم بەرەیەی بە خودی خۆیەوە بەستنەوەو، ئەو بۆ سەرکردەکانی ئەم بەرەیە هەتا ساڵی ٤٧ك سەرچاوەی ڕاستەوخۆی بڕیاردان بوو، ئیدی لەم ساڵەڕا بەرەی خۆرئاوا -واتە مەغریب- خرایە سەر قەڵەمڕەوی والی (مصر)[1].

ب- (معاویە) ڕەزای خوای لیٚ بێت کاری کرد بۆ دامەزراندنی بنکەیەکی جیهادی پێشڕەو لە نێو جەرگەی وڵاتی (مەغریب)، (عوقبەی کوڕی نافیع) (قەیرەوان)ی دروست کرد، تا ببێتە مایەی عیزەتو دەسەڵات بۆ ئیسلامو موسڵمانان.

٣- سیاسەتی (معاویە) لە بەرەی (خۆراسان)و (سوجستان)و (ئەو دیو ڕوبار)دا:

أ- (معاویە) و کۆمەکخواستنی لە (عبداللە ی کوڕی عامر) ی فەتحکەری (سوجستان)و خۆراسان) لە سەردەمی (عثمان) ڕەزای خوای لیٚ بێت داو، داوا لێکردنی تا جارێکی تر فەتحیان بکاتەوە.

ب- کارکردنی شێلگیرانە بەخاتری چەسپاندنی حوکمی ئیسلامیو بڵاو کردنەوەی بانگەوازی ئیسلامی لەم ناوچانەدا، لە ڕێی نیشتەجێکردنی پەنجا هەزار (عەرەب) بە خۆیانو خێزانەکانیانەوە لە (خۆراسان)دا[2].

## چوارەم: پەیڕەوکردنی شوڕا لە بەڕێوەبەرایەتی کردنی بزوتنەوەی فتوحاتدا:-

کاتێك پۆستی خیلافەت ڕادەستی (معاویە) ڕەزای خوای لیٚ بێت کرا. ئەنجومەنی شوڕاکەی لە گەورە ناودارانی سەردەمی خۆیو والیو یاریدەدەرەکانی پێکهاتبوو، کە هەر هەموویان بە سیفەتەکانی ڕەوانبێژیو سیاسەتمەداریو مشورخۆریو چاکبەڕێوەبردنی کارو باری سەربازی ناویان دەرکردبوو، لە نێویاندا ئەم کەڵە مێردانە هەبوون: (عەمروی کوڕی عاص) ڕەزای خوای لیٚ بێت کە بەم سیفەتانەی ڕابردو بەناوبانگ بوو، (خەلیفە) متمانەی تەواوی لەسەر بوو و کردی بە وەزیری دەوڵەتەکەیو ڕاوێژکاری تایبەتی خۆی، (زیاد بن أبیە) یش یەکێکی تر بوو لە ڕاوێژکارەکان، شایانی باسە لە سەردەمی (ئومەوی)یدا وەزارەتو وەزارەتخانە دەستورو قانونی بۆ دانەنرابوو ڕاوێژکارەکانی خەلیفە کارو باری

---

١ ولاة مصر (ص: ٦١)، النجوم الزاهرة (١/١٧٥).

٢ مرويات خلافة معاوية في التأريخ الاسلامي (ص: ٣٦٤، ٣٦٥).

وەزیر یشیان ڕادەپەڕاندن، هەریەکێك لە ئەمانە پێی دەگوترا (کاتیب) یان (موشیر)[١]. جگە لەمەش (معاویە)ی خەلیفە لە بەڕێوە بردنی کارو باری سەربازیدا پشتی بە ڕاوێژی سەرکردەو سەرۆکهۆزەکان دەبەست بەتایبەتی ئەوانەیان کە لە (شام) بوون، لیێیان نزیك دەبۆوەو دەچووە کۆڕەکانیانەوە و ڕاوێژی پێ دەکردن، سەرکردەکانیش لە بەڕێوە بەرایەتیە سەربازیەکانیانو جەنگو جیهادەکانیاندا شوێنپێی (معاویە)ی خەلیفەیان هەڵدەگرتو (شورا) یان پەیرەو دەکرد.[٢]

## پێنجەم: مەرکەزی بوونی سەرکردایەتیو کۆمەك لە حوکمەتی (معاویە)دا :-

کاتێك پۆستی (خیلافەت) بۆ بنەماڵەی (بەنی ئومەییە) گوازرایەوە، (دیمەشق) کرا بە پایتەختی (خیلافەت)و، مەڵبەندی سەرکردایەتی باڵای ئیدارەی سەربازیو،شوێنی تێداحەوانەوەی (خەلیفە) . ئیدی لەوێڕا بڕیاری لەسەر سیاسەتی جەنگو جیهاد دەردەکردو، بەخودی خۆی لەئاقار (جەنگ)و (ئاشتی) بەرپرسیار بوو ، ڕێکخستنی ئیداری کاروباری گشتی سوپا یەکێك بوو لە کارو بارەکانی ناوەندو ڕاستەو خۆ (خەلیفە) سەرپەرشتی دەکرد[٣]. لە گەڵ ئەمەشدا ژمارەیەك لە والی ویلایەتو هەرێمەکان دەسەلاتی ڕەهایان پێدرابوو و بەخودی خۆیان سەرکردایەتی سوپای هەرێمەکانی خۆیان دەکردو سەرکردەی گونجاویان دیاری دەکردنو نەخشەیان بۆ دادەڕشتنو پشتیوانی مادیو مرۆییان دەکردن، (زیاد بن أبیە) ی –والی عێراق– یەکێك بوو لە ڕیزی ئەو والیانە[٤].

یەکێك لەو بەڵگانەی کە مەرکەزی بوونی حوکمەتی (معاویەی کوڕی أبی سفیان) ڕەزای خوای لێ بێت سەبارەت بەدانانی سەرکردە سوپاکانی دەسەلمێنێ ئەمەیە: ئەو نامەی بۆ (زیاد بن أبیە)ی والی (بصرە) نووسیو فەرمانی پێکرد پیاوێکی (سیاسەت مەدار) بۆ (خۆراسان) بنێرێ تا کاروبارەکانی ئەوێ هەڵسوڕێنێ، ئەویش (حەکەمی کوڕی عەمروی غەففاری) ڕەزای خوای لێ بێت ی کردە والی ئەوێ، پەیماننامەی ویلایەتی خۆراسانی بۆ نوسیەوەو جەنگو خەراجی ئەوێی ڕادەست کرد، ئەمەو (حەکەم) بەخۆیو خەڵکانێکی

١ الادارة العسكرية في الدولة الاسلامية (١/٢٨٠).
٢ الفتوح، ابن أعثم (١/٣٤٠)، الادارة العسكرية (١/٢٨٠).
٣ الادارة العسكرية في الدولة الاسلامية (١/٣١٤).
٤ المصدر نفسه (١/٣١٤).

(بەصرە) کە حەزیان لە جیهاد دەکردو ژمارەیەکی باش لە سەر بازانی نیزامی‌و دیواندار بەرەو خۆراسان بە ڕێکەوت، موچەی بۆ بڕینەوەو بە هێزی کردن‌و ئەمجا بەرەو جێبە جێکردنی فەرمانەکان‌و پێکانی ئامانجەکان ملی لێنا[1]. نمونەیەکی تر کە مەکەزی بونی سەرکردایەتی باڵای حوکمەتی معاویە لەبواری سەربازیدا دەسەلمێنێ، بەڕێکرانی سوپاو کۆمەکە سەربازیەکانی ئەوە بۆ شوێنە پێویستەکان، (عەلقەمەی کوڕی یەزیدی غەتیفی) سەرکردە لە (ئەسکەندەریە) بۆ (معاویە) دەنوسیێ: تۆ منت بە سەر (ئەسکەندەریە)وە داناوەو جگە لە دوانزە هەزار سەرباز کەسی ترم لەگەڵدا نیەو، لە کەمیانمان خەریکە یەکتر نەبینین، جا (معاویە) نامەی بۆ ناردەوەو تێیدا نوسیبوو: ئەوامن (عبدالله ی کوڕی مطیع)م بەخۆی‌و چوار هەزار کەس لە دانیشتوانی (مەدینە)وە بۆلا بەڕێکردی‌و، فەرمانم بە(معن ی کوڕی یەزیدی سەلەمی) کردووە-کە ئێستا لە (ڕەملە)یە- بەخۆی‌و چوار هەزار کەس دەستیان لە ڕێشمەی ئەسپەکانیان گیربکەن‌و، هەر کاتێك هاواریان لەلایەن تۆوە تێ بەسترا بۆلات دەپەڕنەوە[2].

## شەشەم: ئاڵاو بەیداخەکان:

لە سەردەمی خیلافەتی (معاویە)و (ئومەوی)یدا فرە ئاڵایی‌و هەڵدانی بەیداخی زۆر لە نێو سوپادا باو بوو، لە گەڵ ئەوەدا کە ڕەنگی سپی سومبولی خیلافەتەکەیان بوو، بەڵام ئاڵاکان بەسەر ڕەنگەکانی وەك (سور، سپی، سەوز)دا دابەش ببون[3]. لە سەردەمی خیلافەتی (معاویە)دا هەر سوپایەك بەرەو ڕووی دوژمن دەردەچوو، بەیداخێکی هەڵدەکردو، وەك‌و دروشم‌و سومبولێك لە دواوەی دەڕۆیشتن‌و بەرگریان لێ دەکرد، دەبینین لە جەنگەکانیاندا، هەر ئاڵا هەگرێك بریندار یان شەهید دەبوو یەکێکی تر ئاڵاکەی بەشەکاوەیی‌و بەرز ڕادەگرت‌و هەموو خەمێکی ئەوان شەکانەوەی ئەو ئاڵایەبوو[4]. لە نێو سوپادا سەرکردە گەلێکی وا هەبون لە ئازایەتی‌و هەنگاو ناندا هێندە بەرەو پێش چوبون کە شایستە بن بۆ هەڵگرتنی ئەو بەیداخە، هەر یەکێك لە (عوقبەی کوڕی نافیع‌و حەکەمی کوڕی عەمروی غەفاری‌و فوزاڵەی کوڕی عوبێدوڵلا) نمونەی ئەو سەرکردە گیانفیدایانە بوون، (معاویە)ی

---

١ الفتوح لابن أعثم (٢/٣١٨).

٢ فتوح مصر (ص: ١٩٢)، الخطط للمقريزي (١/٢٦٨).

٣ تأريخ الطبري نقلا عن الادارة العسكرية في الدولة الاسلامية (١/٣٦٨).

٤ تأريخ الطبري نقلا عن الادارة العسكرية في الدولة الاسلامية (١/٣٦٨).

خەلیفە فەرمانی بە (زیاد بن أبیە)ی والی (بەصرە)کردبوو هەر هۆزێك بەیداخێکی خۆی هەبێ، دەردەکەوێ مەبەست لە ئەمە زانینی ئاستی کارایی‌و پابەندبوونی هەریەکێك لەم هۆزانە بووە بە فەرمانەکانەوە لە جەنگدا[1].

## حەوتەم: (معاویە)و بایەخدانی بە هەواڵگری‌و پۆستەو گەیاندن:

(معاویە) ڕەزای خوای لێ بێت هەر زوو و لەو کاتەوە (والی) وڵاتی شام بوو، بایەخی بەکارو باری هەواڵگری‌و کۆ کردنەوەی زانیاری لەسەر دوژمنان دابوو، کاتێکیش بوویە خەلیفە بایەخی زیاتری پێدا، دەزگای هەواڵگری پەرەی سەند، لە سەردەمی ئەودا موسڵمانێك لە قوستەنتینیە قۆڵبەست دەکرێت‌و لە کۆشکی دەسەڵاتدا سوکایەتی پێ دەکرێ، هاوار دەکاو دەڵێ: هۆۆۆ..معاویە! (لێمان بێ ئاگا بوویت‌و بەزایەتداین). ئەم وتەیە لەرێی هەواڵگرە تایبەتەکانی (معاویە) لە وڵاتی (ڕۆم)ڕا بە (معاویە)دەگاتەوە، ئیتر ئازادی کردو، بەپێی نەخشەیەك ئەو کەسەشی دیل کرد کە سوکایەتی پێ کرد بوو، فەرمانی بە کابرای موسڵمان کرد تۆڵەی خۆی بەپێی ئازاردان‌و سوکایەتی پێکرانەکەی خۆی –نە زیاتر– لە بابای ڕۆمی بکاتەوە، ئەم نمونەیە ئاستی وردەکاری‌و وردبینی دەزگای هەواڵگری حوکمەتەکەی (معاویە) دەردەخا[2]. پێشتر چیرۆکەکە بە دورو درێژی گێڕدراوەتەوە، بەهەمان جۆر(خەلیفە) ڕەزای خوای لێ بێت چاودێریەکی پڕ وردەکاری‌و تۆکمەو دامەزراوی لە سەر تاك تاکی ئەندامانی (حامیە سەربازیەکان)و خاو خێزانەکانیەوە داناو، لە هەر (حامیە)یەکدا کارمەندێکی دامەزراند تا (هاتوان‌و دەرچوان)ی ناوی بپشکنێ‌و لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکا، هەموو ئەمە بەخاتری ئەوەبوو نەبادا سیخوڕو هەواڵگرانی دوژمن خۆ بەنێو وڵاتی ئیسلامی دابکەن‌و بە شوێنی نهێنی سەربازگەکانیان بزانن‌و خاڵە لاوازەکانی نێویان –ئەگەر هەبن– دەست نیشان بکەن[3]. هەر لەحوکمەتەکەی خۆیدا (دیوانی بەرید)ی دامەزراندو، لە پێناو ئەوەدا هەواڵی هەموو شارو دێهات‌و گۆشەو کەناری وڵاتەکەی بەتایبەتی ناوچەکانی سەرسنورو سەنگەر نیشینی بە خێرایی پێ بگات بایەخێکی یەجگار زۆری پێدا، بەر لەئەمە پۆستەو گەیاندن (برید) بێ دیوان بوو[4]. بەڵام پەیوەندی پۆستەچی بەئیدارەی سەربازیەوە:

---

١ تنظیمات الجیش للجنابي (ص: ٢٢٧)، الادارة العسکریة (١/٣٦٩).

٢ نهایة الارب (٦/١٥٨)، الادارة العسکریة (١/٤٠٥).

٣ الجندیة للدقوقي (ص: ١٧٧).

٤ خطط الشام، محمد کرد (٥/١٩).

بریتی بوو لە چاوی تیژو گوێی بە هەستی جەنابی (خەلیفە)و، هەواڵی والی‌و سەرکردەو تەواوی کارمەندانی دەوڵەتەکەی بۆ دەگواستەوە، (خەلیفە) چەند چاودێرو هەواڵگرێکی تایبەت بەخۆیەوە هەبوون کە هەموو هەواڵێکی گەرمو گوڕو تازەی ولاتیان پێ ڕادەگەیاند، هەروەها (پۆستەو گەیاندن) بریتی بوو لە هێڵی پەیوەندی نێوان خەلیفەو والی‌و سەرکردەکان‌و فەرمانە سەربازیەکانی لە نێواندا دەگواستنەوە، پۆستە چیەکان چاودێرو پشکنەری دەوڵەت بوون‌و لە هەموو دۆخەکانی جەنگو ئاشتی و تەواوی بارو دۆخ‌و کاتەکانی تردا ڕاپۆرتگەلی خۆیان لەسەر دۆخی سەربازەکان‌و باری دارایی‌و موچە ئامادە کرد، بەشێوەیەك کەڕاپۆرتی خۆی لەسەر سەرپەرشتیکاران‌و موچەی ڕەعیەتەکانیانی لە کۆڕێکدا دەخستە بەرباس‌و لێکۆڵینەوەو لیستی موچەکانی تەماشا دەکردن‌و هەر ئەوکاتە تێبینیەکانی خۆی لەسەر دەنوسین، وێڕای ئەمەش یەکێکی تر لە ئەرکەکانی پۆستەچی بریتی بوو لە یارمەتیدانی ئیدارەی سەربازی لە بواری کۆمەکی دارایی‌و پاراستن‌و چاککردنەوەی ڕێگاو بانەکان لە بەرانبەر دوژمنان‌و دزەکردنی سیخوڕەکانیەوە لە وشکانی‌و دەریایی یەوە، هەرچی نامەی سەنگەر نشینان‌و والی‌و کاربەڕێوەبەرانی ولاتە سەرسنورو دورەکان هەبوون ڕادەستی ئەو دەکران‌و ئەویش بەحوکمی شارەزایی باشی لە ڕێگاو بان‌و تێکڕای شوێنەکانی ولات‌و لە بەردەستدابونی ولاخەبەرزەی باش بە قەد بڕی‌و ئەو پەڕی خێراییەوە دەیگەیاندن، هەرکاتێکیش (خەلیفە) لەکاتی بەڕێکردنی سوپا یان هەرشتێکی تر پێویستی پێبوایە ئەوا ئەو ئەم ئەرکە سەربازی‌و ئیداریەی بۆ ڕادەپەڕاند[1]. بەشێوەیەکی گشتی بە پۆستەچی دەگوترا (جوتباڵی موسڵمانان) چونکە لە کاتی گەیاندنی نامەکاندا بە خێرایی‌و پڕتاو هەواڵ‌و نامەکانی دەفڕاندن‌و بەشوێنی مەبەستی دەگەیاندن[2].

## هەشتەم: (معاویە)و گرنگی دانی بە سنوری‌و شکانی دەوڵەت:

هەر کە پۆستی خیلافەت ڕادەستی (معاویە)کرا، بەخاتری پاراستنی سنورەکانی دەوڵەتی ئیسلامی گرنگی زیاترو زیاتر بە قەڵاو شورەو مەحکەمکردنی سەنگەرەکانی پێشەوە درا، بەتایبەتی کەزانیمان (معاویە) ڕەزای خوای لێ بێت دامەزرێنەری دەوڵەتی (ئومەوی) بووەو لە سەردەمی هەردوك خەلیفە(عمرو عثمان) ڕەزای خوایان لە سەربێت داو لەو کاتەدا والی (شام) بوو، بە خودی خۆی سەرپەرشتی هاوینە هێرش‌و زستانە هێرشەکانی

---

١ الادارة العسكرية في الدولة الاسلامية (٤٠٦/١).

٢ ثمار القلوب للثعالبي (ص: ٢٤١)، الادارة العسكرية (١/ ٤٠٧).

دەکردن، وەك لە پێشدا باسمان کرد دروستکردن‌و نۆژەنکردنەوەی ژمارەیەك قەڵاو شورەی سەنگەرەکانی پێشەوەی بەرگریش لە سەردەمی هەردوك خیلافەتی ئەم دوو ئیمامەدا پاڵدراونەتە لای (معاویە)و، ئاماژەشمان بۆ ئەوەکرد کە ئەو چەندەی بایەخ بەم ڕوانگەو سەنگەرو قەڵایانە دەدا، بۆیە کاتێك بووبە خەلیفە هەموو ئەو کارانەی دەستی پێکردبوون هات تەواوی کردن، لەسەر سنوری (جزیرە) هەردوك قەڵای (مەرعەش‌و حەدەس)ی دروست کردن‌و سەربازگەلی تێدا نیشتە جێ کردو، بەردەوام بەسەری دەکردنەوەو مشوری لێ دەخواردن[1]. لە پێناو قایمکردنی شارە کەناریەکان سیاسەتی ڕاگواستنی گرتە بەرو، خەڵکانێکی لە فارسە نیشتەجێکانی (بەعلەبەگ‌و، حیمس‌و، ئەنتاکیە)ی بەرەو کەنارەکانی ئەردەن‌و صوروو عەککاو چەند شوێنێکی تر گواستنەوەو، خەڵکانێکی تریشی لە (زتە)ی قولە ڕەش‌و سوارانی نەتەوەی فارسی نیشتەجێ لە (بەسرەو کوفە)و تاقمە فارسێکی نیشتەجێی (بەعلەبەگ)ی بەرەو (ئەنتاکیە) ڕاگواستن.[2] سەرکردە (عبدالعزیز کوڕی حاتەمی باهیلی) کردە والی (ئەرمیناو ئازەربایجان)و ئەویش شاری (دبیل)[3]ی دروستکردو، ژمارەیەك شورەی بەرگری بەرز کردنەوەو شاری (نەشوی)[4]ی بینا کردو، شاری (بەرزەغە)[5]ی چاککردەوەو، (بەیلەقان)[6]یشی سەر لە نوێ دروست کردەوە، ئەمە وێڕای ئەوە ژمارەیەك (قەڵاو شورەی بەرگری)یشی دروست کردن.[7] هەروەها (زیاد بن أبیە)ی والی (عێراق) سەرکردە (ڕەبیعی کوڕی حاریس)ی بەرەو سەنگەرەکانی پێشەوەی خۆراسان[8] بەڕێ کردو نزیکەی پەنجا هەزار سەربازی لە دانیشتوانی هەردوك شاری (کوفەو بەسرە) بە خۆیان‌و خێزانەکانیانەوە لەگەڵ ناردن‌و، بە خاتری پاسەوانیکردنی هێڵە سنووریەکانی دەوڵەتی ئیسلامی لە ئەوێ لە نزیك ڕوباری نیشتەجێ کردن،[9] وەکو دەردەکەوێ (زیاد) بایەخی زۆری بەکاروباری سەنگەرەکانی پێشەوەی سەر سنووردا وە، بە (دەرگاوان) واتە: سکرتێرەکەی

---

١ الادارة العسكرية (٢/٤٧٣).

٢ ئەمە لە ساڵی ٤٢ك بووە، فتوح البلدان (١/١٣٩).

٣ دەکەوێتە (ئەرمینیا)و لەگەڵ (ئەران) هاوسنوورە.

٤ دەکەوێتە (ئازەربایجان)، معجم البلدان (٥/٢٩٦).

٥ لەوپەڕی (ئازەربایجان)ە، معجم البلدان (١/٣٧٩).

٦ لە ئەرمینیای گەورەیەو لە (شروان) نزیکە، معجم البلدان (١/٥٣٣).

٧ الادارة العسكرية (٢/٤٧٤).

٨ الادارة العسكرية (٢/٤٧٤).

٩ ئەمە لە ساڵی ٥١ کۆچیدا بووە، الادارة العسكرية (٢/٤٧٤).

دەڵێ: دەرگاوانیو سکرتیاریەتی خۆم پێدای، بەڵام دەرهەق بە چوارشت لێت دەخەمو، یەکێك لەم چوارشتانە ئەمەبوو: دەرهەق بە نێردراوی کاربەڕێوەبەری سوپای سەنگەر نشینی سنوورپارێز، ئەگەر ئەو ساتێکی کەم بەدرەنگ بکەوێ کاری ساڵێك دوادەکەوێ، کەواتە خێرا بیکە ژورەوە، ئەگەر لە نێو پێخەفەکەشمدابم قەیناکا.[1] (زیاد) پرسیاری لە ئەندامانی مەجلیسەکەی کرد خۆشگوزەرانترین کەس کێیە؟.. لە وەڵامدا وتیان: خۆت ئەی ئەمیر!، وتی: لە کوێ! لە بەر کارو باری سنورو خەڕاج بەوەڕادەگەم؟![2]. دەری دەخا کە (زیاد) چەندە بە هۆی خەملێخواردنو بەڕێوەبردنو پاراستنو بەرگریلێکردنی ناوچە سەنگەر نشینە سەر سنوریەکانی خۆرهەڵاتەوە باری گران بووە، دەگوترێ (زیاد) وتویەتی: چوار پۆستی کار هەن جگە لە کەسی بەتەمەنی خۆڕاگری خاراوی دانبەخۆداگر بەکەسی تر سەر پەرشتی ناکرێنو بەڕێوە نابرێن: (کارو باری سەر سنور، هاوینە هێرش، پۆلیس، دادوەری)[3]. هەروەها (عەمروی کوڕی عاص) ڕەزای خوای لە سەربێت (بە حوکمی)ئەوە زۆرینەی داهاتی (خەڕاج)و (بەیتولماڵە)ی وڵاتەکەی لە قایمکردنی قەڵاو شورەو سەنگەرەکانی پێشەوەی سەرسنوری (مصر) خرج دەکردو بەشێکیشی دەکردە موچەی سەربازانی سەنگەر نشینی، بۆیە تەنها کەمێکی کەمی لەو دەرامەتە بۆ (معاویە)ی خەلیفە بەڕێ دەکرد[4]. (معاویە) بایەخی چاکی بە چالاکیەکانی (هاوینە هێرشو زستانە هێرش)دەدا، بە چەشنێك هەموو ساڵێكو لەکاتی دیاری کراوی خۆیانداو بۆ جێبەجێکردنی کارەکانی پەیوەست بەخۆیانەوە دەردەچونو، گەورەسەرکردەو میرە ئەزموندیەکانی بەسەرەوە دادەنان، هەریەکێکیش لەوان بەئاواتەوە بوو ئەم پۆستە وەربگرێتو بەمایەی شانازی حیساب دەکردبۆ خۆی، نمونە بۆ ئەمە ئەو وتەی (معاویە)یە کە ئاراستەی (یەزید) ی کوڕی کردو، وتی: هۆ کوڕی خۆم! ئەمیری ئیمانداران ئاواتەکانت بەجێ دەگەیەنێ، جا پێویستیەکانت بڵێ، ئیدی ژمارەیەك داواکاری وتنو، لە پێش هەموویانەوە وتی: داوادەکەم لە ئەمیری ئیمانداران پۆستی سەرکردایەتی هاوینە هێرشی ئەمساڵم پێ بدا، بەڵکو لە ڕێی سازکردنی سوپاکانی ڕێی خودا لە کاری خۆم دەست بەکاریم.[5] هەردووك سەرکردە

---

١ الأوائل للعسكري، نقلا عن الادارة العسكرية (٤٧٥/٢).

٢ المحاسن والمساوي (ص: ٢٦٩).

٣ تأريخ اليعقوبي، الادارة العسكرية (٤٧٥/٢).

٤ فتوح مصر (ص: ١٠٢).

٥ أنباء نجبا إلابناء (ص: ١٠٦). لابن ظفر المالكي، الادارة العسكرية (٤٧٦/٢).

(سوفیانی کوڕی عەوفی عامیری ئەزدیو، مالیکی کوڕی هەبیرەی سکونی) دیارترین کەسایەتی نێو ڕیزی ئەو والیو سەرکردانە بوون کە لە سەردەمی (معاویە)دا بۆ چەند جارێك سەرکردایەتی هاوینە هێرشو زستانە هێرشەکانیان کردبێت[1]، (معاویە)ی ئەمیری ئیمانداران ڕەزای خوای لێ بێت بەر لەوە سەرکردە بۆ ئەو سوپا هێرش بەرانە دیاری بکا، دەهات بەخاتری زانینی ئاستی بیرتیژیو ئاقڵمەندی سەرکردە(لەبواری ئیدارەی سەربازیدا) ژمارەیەك لە کەسایەتیەکانی ئەزمون دەدان، (سوفیانی کوڕی عەوفی غامیدی) بەحوکمی شارەزابوونی لە ئیدارەدا یەکێك بوو لەو سەرکردانەی (معاویە) پشتی پێ دەبەست، ئەو لە کاتی گەشتە جیهادیەکەیو بەڕێوەبردنی کارەکانی خۆی لە دواهەمین هاوینە هێرشیدا کۆچی دوایی دەکا، کاتێك (معاویە) هەواڵی مەرگی (سوفیان)ی پێ دەگا لەتاوانی دەتاسێ، ئیتر پرسەنامەی خۆی بەسەر سوپاکانو شارەکاندا بڵاو کردەوەو پەرۆشی خۆی بۆ ڕاگەیاند، هەرجارێ (معاویە) کەمو کورتیەکی لە هاوینە هێرشەکاندا بەدی کردبایە، دەیگوت: وای ئای بۆ (سوفیان)!، بەخوا (سوفیان)م نەماوە!،[2] ئەمەو (معاویە) ڕەزای خوای لێ بێت سەبارەت بەگرتنەبەری هەنگاوی چاكو تەگبیرو بۆچوونی باشو مشور لێخواردنی پێویست بۆ پاراستنو پاسەوانیکردنی خاكو سنوری دەوڵەتی ئیسلامیو بەرگریکردنی کەمتەرخەمی نەکرد.[3]

## نۆیەم: (معاویە)و بایەخدانی بە کەشتیرانیو سنوری دەریایی:

کاتێك دەوڵەتی (ئومەوی) بەرپابوو، (معاویە) ڕەزای خوای لێ بێت کەشتیگەلێکی زۆری سەربازی دروستکردنو پاسەوانو چاودێری زۆری لەو دورگەو کەنارانە بڵاوکردنەوە کە سوپای ئیسلام دەستی بەسەردا گرتبونو کردبونی بە بنکەو دامەزراوەی هێزی دەریایی خۆی، (معاویە) بەم هەنگاوانەی هەموو ئەو کارانەی خۆی تەواو کردن کە لە سەردەمی ویلایەتی شامیداو بەخاتری دروستکردنی هێزی دەریاوانی ئیسلامیو پاراستنی کەنارە ئاویەکانی دەوڵەتی ئیسلامی بناغەی بۆ دارشتبوون، کاتێك ڕۆمەکان لە سەر دەمی خیلافەتی ئەودا لە کەنارەکانی (شام) دەرچوون، فەرمانی دا پیشەوەرو دارتاشەکان کۆ ببنەوە، ئیدی کۆبونەوە (لە کەنارەکانی شامدا) ڕێکی خستن، لە (جوندی ئەردەن)ی سەر

١ الادارة العسكرية (٢/٤٧٧)، الاصابة (٣، ٢٣٧).
٢ تهذيب تأريخ دمشق (٦/١٨٥)، الادارة العسكرية (٢/٤٧٧).
٣ الادارة العسكرية في الدولة الاسلامية (٢/٤٧٨).

بە (عەکا) ناچەیەکی پیشە سازی بۆ دروستکردن، وەك زانراوە ولاَتی شام لە ڕوی دارو درەختی وا کە بۆ تەختەو پارچە سەرەکیەکانی کەشتی ئەو ڕۆژگارە دەستیان دەدا دەوڵەمەند بوو[1]. بە هەمان جۆر (معاویە) لە ساڵی ٥٤کۆچیداو لە (مصر)، لە سەردەمی ویلایەتی (مسلمەی کوڕی مخلدی ئەنساری)یدا یەکەمین ناوچەی پیشەسازی بۆ دروستکردنی کەشتی گەورەو بەلەمی جەنگی جۆراو جۆر دامەزراند، بارەگای ئەم پیشەسازیە لە ناوچەی (ڕەوزە) بووو، هەر لەبەر ئەمەش بوو کە بەناوی (صناعەی ڕەوزە) ناوی دەرکردبوو[2]، خودی سەرکردەی هێزە دەریاوانیەکانی سەر بە (خەلیفە معاویە) لە بواری دروستکردنی (کەشتی جەنگی)یدا دەستێکی بالاًیان هەبوو و شارەزا بوون، ڕاپەڕاندنی ئەرکێکی سەربازی لە نێو خاکی (ڕۆم)دا بە یەکێك لەو سەرکردانەی سپاردو، داوای لێ کردو وتی: بەلەمێکی چەمد سەڵبەیی دروست بکەو لە کاتی بەڕێکەوتن بۆ ولاًتی (ڕۆم) بەکاری بێنە[3]. مەبەستی پێ لە دروستکردنی سوکانی سەڵبەکان بوو لە باری ناوەوەی لاتەنیشتی بەلەمەکەدا[4].

ئەمەو لەسەردەمی (معاویە) ڕەزای خوای لێ بێت دا ژمارەی کەشتیە جەنگیەکان گەیشتە هەزارو حەوسەد کەشتی گەورەی وا کە هەر یەکێکیان پڕدەکرا لە سەربازو چەكو زەخیرەو تەواوی کەرەستەو پێویستیەکانی جەنگی دەریایی[5]. بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێ کە (معاویە) ڕەزای خوای لێ بێت بە ڕاوبۆچونی ژیرانەو ئامانجهەنگیۆی خۆی دەرکی بەو ڕاستیە کردووە کە ناوچە کەناریەکانی (شام)و (مصر) تەنها بەبوونی کەشتیگەلی‌و سوپای دەریاوانی ئیسلامی لە چەنگ هێرش‌و پەلاماری (ڕۆم) ڕزگاریان دەبێ‌و، هەر بەهۆی ئەوەوە هەنگاو بەهەنگاو جار لە دوای جار هێرش دەکرێتە کەنارەکانی (ڕۆم)و بەمەش دوژمن چاو ترساوو زراو ڕژاو دەبێت، بەڵێ بەم جۆرە (معاویە) هەزارو یەك حیسابی بۆ دەکردن[6]. ئیدی لە سەردەمی (معاویە)دا هێزی کەشتیگەلی ئیسلامی دەستی بەفەتحکردنی یەك لەدوای یەکی دورگە هەڵکەوتوەکانی نێو دەریای نێوەڕاست کرد کە (ڕودس) [7] یەکێك بوو لەو دورگانەوە،

---

١ المصدر نفسه (٢/٤٧٨).

٢ حسن المحاضرة للسيوطي (٢/٣٧٨)، الادارة العسكرية (٢/٥٤٣).

٣ نهاية الأرب (٦/١٨٦).

٤ الادارة العسكرية (٢/٥٤٤).

٥ خطط الشام (٥/٣٧)، محمد كرد علي.

٦ الحدود الاسلامية لبيزنطة، فتحي عثمان (١/٢٣٧).

٧ (ڕودس) دوورگەیەکی سەر بە ولاَتی (ڕۆم)ەو لە بەرانبەر (ئەسکەندەریە)یە.

–وەك لە پێشدا باسمان کرد– بە سەرکردایەتی سەرکردە (جەنادەی کوڕی ئومەییەی زەهرانی ئەزدی) بەشەڕ فەتح کرا [1]. ناوچەیەکی بیشەڵان بوو و، بە پیت‌و بەرەکەتترین دوڕگەی ناوچەکەبوو، بەفەرمانی ئیرادەی باڵای ناوەندی سەربازی کۆمەڵێك موسڵمانی تێدا نیشتە جێ کردن‌و، بەخاتری ئاگاداربوون لە جمو جۆڵی دوژمن‌و کەسانێك بیانەوێ بە فێڵ سەریان دەدەن قەڵایەك‌و ڕوانگەیەکی تێدا دروست کرد، ئیتر لەوێڕا موسڵمانەکان سەیتەرەیان بەسەر دوڕگە ڕۆمیەکانی تردا دەکرد، (معاویە)ی خەلیفە لەو دورگانەدا ئاڵ‌و گۆڕی بەسەربازەکان دەکردو، زۆری ڕانەدەگرتن‌و،خوردو خۆراك‌و موچەی باشی بەسەردا دەڕشتن، سەربازە نیشەجێکانی (ڕودس) هەڵۆ ئاسا پەلاماری ڕۆمەکانیان دەداو، لەدەریادا بەربینگیان پێ دەگرتن‌و کەشتیەکانیان لێ دەستاندن، بەمە دوژمن زۆریان لێ دەترسا [2]. ئیدی (معاویە) لەسەر فەتحکردنی دورگە دەریاییەکان بەردەوام بوو و، پڕی دەکردن لە سەربازی سەنگەر نشینی‌و سنور پارێز، بەم جۆرە ئەم دورگانە چەند(بنکەیەکی دەریایی) یان لێ دروست بوو و کرانە شورەو قەڵاو سوپەری کەنارەکانی دەوڵەتی ئیسلامی [3]. بەم جۆرەو لەسەر دەمی(معاویە)دا هاوینە هێرش‌و زستانە هێرشە دەریاییەکان قەدبڕ لە دەریایان دەداو شەقڵیان بە نێو شەپۆلەکانی دەداو بەهاوشانی هێرش‌و پەلامارە وشکانیەکان (کە بۆ پارێزگاریکردنی کەنارە دەریاییەکانی ناوچەکە) لە (مصر)و (شام)ەوەو بەسەرکردایەتی کەڵە میرە بەناوبانگەکانی وەك (یەزیدی کوڕی ئەبی ئەرتەئەی عامری‌و، جەنادەی کوڕی ئومەییەی زەهرانی‌و، عوقبەی کوڕی عامرو، چەندین سەرکردەی تریش) دەردەچوون، دوابەدوای (معاویە)ش، تەواوی خەلیفکانی دەوڵەتی (ئومەوی)لەم بوارەدا پەیڕەویان لە (معاویە)کردو، هێزی کەشتیگەلی ئیسلامی لە گەشەسەندنێکی بەردەوام دابوو، ئیدی کەشتی زۆریان دروست دەکردن‌و هونەرمەندییان لە چاکدروستکردنیاندا پەیڕەو دەکردو بە کەرەستەو ئامڕازی تازەی کەشتیڕانی‌و جەنگی دەوڵەمەندیان دەکردن‌و، سوپای تایبەت بە خۆیان لە سەرکردەو سەربازگەل بەسەرەو دادەناو، پارەو بودجەی تایبەتیان بۆ تەرخان دەکردن، کاربەوە گەیشتبوو هاوینە هێرش‌و

---

[1] الاستیعاب (٢٤٣/١)، الاعلام للزركلي (١٤٠/٢).

[2] النجوم الزاهرة (١٤٤/١)، الادارة العسكرية (٥٤٥/٢).

[3] الادارة العسكرية في الدولة الاسلامية (٥٤٥/٢).

زستانە هێرشەکانی هێزی کەشتیگەلی‌و دەریاوانی ئیسلامی هەموسالێك بۆ چەندین جار (ڕۆم)یان دەهەژاندو هەڕەشەیان لە کەنارو سنوورە ئاویەکانی ئەو دەوڵەتە دەکرد[1].

## دەهەم: بایەخدان بە دیوانی سەربازو موچە:

دیوانی سەرباز لەسەر جێبەجێکردنی هەموو ئەم ئەرکانە بەردەوام بوو کە پەیوەندیان بەئەوەوە هەبوو، بەهۆی زۆربوونی فتوحات‌و بەرفراوانبونی خاکی دەوڵەتی ئیسلامی پەرەی پێ دراو، لەلایەن خەلیفەو والیە کانەوە بایەخی تایبەتی پێ دراو لەم ماوەیەدا بەچەند قۆناغێکی گەورەبوندا تێپەڕی‌و کاربەوەگەیشت دامەزراوەیەکی گەورەی لێ پێکهات، لە سەرەتای خیلافەتی (معاویە)ڕزای خوای لێ بێت دا هەندێك سەرباز لە ئەنجامی کاریگەری ئاشوبو ململانێ ناوخۆییەکانی پێشدا تەنبەڵیان دەنواندو خۆیان لە غەزا دوادەخست، جا بەهۆی زۆرزانی‌و هەڵسوکەوتی جوان‌و لەباریەوەو بەخاتری ئەوە سەر لەنوێ پابەندی ئەرکی سەربازی خۆیان بینەوە دڵنەوایی دەکردن‌و موچەی زۆری بەسەردا هەڵدەڕشتن[2]. ئیدی سەرۆکی هۆزەکان لێی نزیك بوونەوەو، ژمارەی ئەو سەربازە نیزامیانەی لە سەرەتای سەردەمی ئومەوی موچەیەیان وەردەگرت گەیشتبونە نزیکەی: هەشتا هەزار سەرباز لە (بەسرە)و، شەست هەزار لە (کوفە)و، چل هەزار لە (مصر)و دەوروبەری ئەوەندەش لە (شام)، ئەمە جگە لە تەواوی ئەو سەبازانەی لە هەرێمەکانی تری دەوڵەتی ئیسلامی وەك: فارس‌و ئەودیوڕوبار(ماوراالنهر)و شوێنەکانی تریش بڵاو ببونەوەو وەکو ئەوان موچەیان پێ دەدرا[3]. هەروەها نزیکەی بیست هەزار کەسی نا عەرەب لە (کوفە) هەبون‌و (عەجەمی سور) یان پێ دەگوتراو بەهەمان شێوە موچەیان بۆ دیاری کرابوو،[4]. لە (بصرە)شدا دووهەزار دیلی (بوخارا)یی هەبوون‌و لە تیرهاوێژی‌و نیشانەشکێنیدا شارەزایی چاکیان هەبوو! (معاویە) خستنیە خزمەتی سەربازی یەوەو موچەی بۆ بڕینەوە، لە (دیمەشق)ی پایتەختی حوکمەتی ناوەندی (معاویە)دا (عەمروی کوڕی سعیدی کوڕی عاص) سەرپەرشتی تۆمارکردنی ناوی سەربازانی دەکرد، ئەمە وێڕای هەمو ئەو دیوانە سەربازیە مەحەلیانەی لە هەرێمەکانی تری دەوڵەتی ئیسلامیدا هەبون‌و ئەرکی ئیدارەسەربازیە مەحەلیەکانیان بە

---

١ الادارة العسكرية في الدولة الاسلامية (٢/٥٤٦).

٢ المصدر نفسه (٢/٦٤٣).

٣ فتوح البلدان (ص: ١٠٢)، الادارة العسكرية (٢/٦٤٤).

٤ الاخبار الطوال (ص: ٢٢٨)، نقلا عن الادارة العسكرية في الدولة الاسلامية (٢/٦٤٤).

خۆدەگرت[١]. هەرچی(عەریف)و(نەقیب)ە کانیش بوون حوکومەت لە کاروباری سەربازیی و داراییو بەتایبەتی لە دابەشکردنی موچە بەسەر سەربازاندا پێویستی پێ بوونو پشتی پێ دەبەستن، ئەوان لەسەر گێرانی ڕۆڵی خۆیانو ئەنجامدانی ئەرکەکانی پێشدایان بەردەوام بوون، هەر تیرەیەك عەریفێکی هەبوو، (معاویە)ی خەلیفە موچەی سەربازانی هەر تیرەیەکی دەدا بەبابای (عەریف) و ئەویش بەسەریدا دابەش دەکردن[٢]. ئەمە لەگەڵ ئەوەدا بارودۆخو هەواڵی سەربازەکانیان بە ڕاپۆرت ڕادەستی ئیدارەی باڵای سوپا دەکرد[٣]. (زیاد بن أبیە)ی پەیکەری ڕێکخستنی سەربازی بۆ عەریفەکان بەرەو پێش بردو خەڵکی لە (بەصرە)داکردە پێنج قۆڵو، بە سەر هەر پێنج کەسەوە بەرپرسێکی داناو، لە (کوفە)شدا خەڵکی کردە چوار قۆڵو بەسەر هەر دە کەسەوە بەرپرسێکی بەسەرەوە دانا ، لەلایەکی ترەوە ئەم عەریفانە لە بەرانبەر ڕەوشو باری هێمنایەتیو هەڵگیرسانی هەراو ئاشوب لە نێو هۆزەکانیانو سەربازگەکانیاندا بەرپرسیاربوون، ئەوان لەنێو ئیدارەی سوپادا ئاڵقەی گەیەنەری هۆزو تیرە عەرەبەکانی ولاتانی ئیسلامی بون بە دەسەڵاتە ئیداریەکانی دەوڵەتەوە ، سەبارەت بە ناونوسکردنی سەربازەکانیان لە نێو تۆمارە کانداو، دابەشکردنی موچە بە سەریانداو، بانگراهێشتکردنیان لە کاتە پێویستەکاندا. ئەم (عەریف)انە لە دەستڕۆیشتنو گوێڕایەڵی بۆ کردندا جێگەی سەرۆکی هۆزوتیرەکانیان گرتبۆوە، ئەوان بە خاتری ئەوە بتوانن ئەرکەکانیان لە بەرانبەر ئیدارەی سوپادا بەچاکی ئەنجام بدەن لە نێو خەڵکانی دەستڕۆیشتوو و بەدەسەڵاتدا هەڵدەبژێردران[٤]. نمونە لەسەر ئەمە ئەو وتارەی (زیاد)ە کە ئاڕاستەی دانیشتوانی (بصرە)ی کردو،هەڕەشەی بڕینی موچەکەی لێکردن ئەگەر خەواریجەکانی لە کۆڵ نەکەنەوە، وتی: هۆ دانیشتوانی بەسرە ! وەڵڵاهی یان ئەوانەم لە کۆڵ دەکەنەوە، یان لە ئێوەڕادەست پێدەکەم، وەڵڵاهی ئەگەرتاکە کەسێك – لەو خەواریجانە– بەساغی دەرباز بێتو بۆی دەرچێ ئیمساڵ تاکە درهەمێکتان نادرێتێ، جا خەڵك شۆڕشیان لێکردنو هەموویان کوشتن[٥]. هەروەها (وەکو هاندانو دڵخۆشکردن) لە سەروی موچەوە زیادانە– دەرماڵە–ی دەدا بەو سەرکردەو سەربازانەی خێرا بەدەنگیەوە دەهاتنو

١ الترتیب الاداریة (١/١٢٩)، الادارة العسكرية (٢/٦٤٤).
٢ نسب قريش (ص: ١٥٤)، الادارة العسكرية (٢/٦٤٤).
٣ خطط الشام (٥/٧).
٤ تنظيمات الجيش (ص: ٢٢٣)، الادارة العسكرية (٢/٦٤٦).
٥ تأريخ الطبري، نقلا عن الادارة العسكرية (٢/٦٤٦).

کارەکانیان ئازایانەو چالاکانە ئەنجام دەدان، وێڕای دەرماڵە، بەڵێنی پێ دەدان کە لەپۆستی سەربازیشدا پلەی بەرزتریان پێ دەبەخشی[1] ئیتر (معاویە) چ هەڵوێستێکی لە بەرانبەر پیاو ماقوڵان و دەست ڕۆیشتوانی شام دەنواند، زیادیش پەیڕەوی لە ئەو دەکرد.

## یازدەهەم: کاریگەری زانستی و ئابوری و کۆمەلایەتی لە سەر (فتوحات) لەسەردەمی معاویە ڕەزای خوای لێ بێت دا:

یەکێك لەو دیاردە زانستی و ئەدەبیانەی لەسەر دەمی (معاویە)دا گەشەی زیاتری بەخۆوە بینی هەبوونی پۆلی حیکایەتخوان (چیرۆك بێژ)ە کان بوو، چەشنی قورئانخوێنەکان بەنێو سەربازانی سوپادا بڵاو ببونەوەو، شکۆمەندی پێشینانیان و هۆنراوەی حەماسی یان بەسەردا دەخوێندنەوەو دەیانخرۆشاندن، ئیتر گەرم و گوڕو چالاکتر دەبوون و بەخێرایی و بەبێ دواکەوتن بەرەو بەرەکانی جەنگو جیهاد بەڕێ دەکەوتن، واعیزو وتار بێژەکانیش هاوچەشنی قورئانخوێن و حیکایەتخوان و شاعیرەکان ئەم ئەرکەیان ڕادەپەڕاندو هەستی فیداکاری و پێشمەرگایەتیان دەبزواندن و باری دەرونیان لە جەنگدا بەرز دەکردنەوە[2]. (معاویە)ی خەلیفە ڕەزای خوای لێ بێت لە میانەی ئەداکردنی وەسێت و ئاڕاستەو ئامۆژگاریە زانستیەکانی لەبەرانبەر سوپاو سەرکردەکانیدا پەیڕەوی لە خەلیفە ڕاشیدەکانی پێش خۆی (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەکرد، کاتێك (عبیدالله ی کوڕی زیاد) ی بەسەر سنورو سەنگەرە ئەمامیەکانی (خۆراسان)ەوە دانا ڕستە وەسێتێکی باشی ئاراستە کردو، یەکێك لەو وەسێتانەی ئەمەبوو. تەقوای خودا بکە، نەکەی هیچ شتێك بخەیتە پێش تەقوای خوداوە[3]، ئیدی پێشدا قسە لەسەر ئەمە کراوە. یەکێك لەو شوێنەوارە زانستیانەی شارستانیەتی ئیسلامی سەردەمی (معاویە) ئەمە بوو: کاتێك دورگەی (ڕودس)ی فەتح کرد،(موجاهیدی کوڕی جەبر)ی (قورئانزان)ی لە گەڵ بوو،(موجاهید)لەوێ نیشتەجێ بووو،خەڵکەکەی لەو مزگەوتەدا کۆ دەکردەوە کە لە میانەی فەتحکردنیدا دروستکرابوو، فێری خوێندنی قورئانی دەکردن و ئەحکام و ئادابەکانی ئیسلامی بۆڕون دەکردنەوە، ئەمەی گوتمان نمونەیەکە لە نێو هەزاران نمونەی ئاوادا. لە کاتێکدا ئەم شوێنەوارە زانستیە تەنها بەسەر دورگەی (ڕودس)دا

---

١ المحاسن والمساويء (ص: ٦٤٦)، الادارة العسكرية (٢/٤٦٧).

٢ الفن الحربي (ص: ١١٧)، نقلا عن الادارة العسكرية (٢/٧١٨).

٣ تأريخ الطبري (٦/٢١٣).

کورت هەڵنەهاتبوو، بەڵکو تەواوی هەرێم‌و گەلانی تری ئیسلامیشی گرتبۆوە[1].هەروەها یەکێك لــە شــوێنەوارە ئــابووری‌و کۆمەڵایەتیــەکانی بزوتنــەوەی فتوحــات: (موســلیمەی کــوڕی موخەلەدی ئەنساری) ی والی (مصر)و تەواوی والیەکانی تــریش، لــە ســەر دەمــی (معاویــە)دا ڕەزای خوای لێ بێت، پاش دابڕکردنی برێکــی (خــەراج‌و بەیتولماڵــە)بۆ چاکردنەوەی زەویــە کشتوکاڵەکانی (مصر)و دروستکردنی کەنداوو پردو جۆگا، داهاتی (خەراج)یان بۆ بەیتولماڵی گشتی دەوڵەت بەڕێ دەکرد، وەکــو یارمەتیــەك بــۆ دانیــشتوانی هــەردوك حــەرەمی پــیرۆزی مەککەو مەدینە (گەنم‌و دانەوێڵە)یان بۆ (حیجاز) دەنارد[2]، لەســەردەمی (معاویــە)دا ناوچــەی پیشە سازی – بۆ دروستکردنی بەلەم‌و پاپۆڕ– لە دورگەی (ڕەوزە)و دروستکراو، پێنج سەد کەسیش لەوێدا وەکو فریاگوزار لە حاڵەتی ئامادەباشیدا بوون‌و، بە پەلە دەگەیشتنە شــوێنی ڕوداوە کتوپڕەکــانی وەکــو ســوتان‌و ڕوخــان‌و لافــاو، خزمــەتی کۆمەڵایــەتیان پێــشکەشی دانیــشتوانی ناوچــەکە دەکــرد[3]. یــەکێك لــە ڕســتەی دەســتەبەری گــوزەرانی کۆمەڵایــەتی لــە سەردەمی (معاویە)دا، بریتی بوو لە چاودێرکردنی ڕۆڵەو خێزانــی شــەهیدان‌و جێبــەجێکردنی کاروبارەکانیان‌و بڕینەوەی مووچە بۆیان[4]. (معاویە)بە ئەنــدامانی مەجلیــسی خــۆی دەگــوت: ئائێوە –جیا لە خەڵکانی تر– بە هۆی ئامادەبوونتان لــەم مەجلیسەدا شــەرەفمەند بــوون‌و، بــەناوی ئەشــراف‌و پیــاو مــاقوڵ بــانگ دەکــرێن پێویــستی ئــەو کــەس‌و خەڵکانــەمان بــۆلا بەرزبکەنەوە کە دەستیان بە ئێمەڕاناگا، پیاوێك هەڵدەســتاو، دەیگــوت: فڵانەکــەس شــەهید بووە، ئەویش دەیگوت: موچە بۆ ڕۆڵەکانی ببڕنەوە[5]. کاتێك (معاویە) مۆڵەتی بــە (عبــدالله ی کــوڕی صــفوان ی کــوڕی ئومەییــە)دا بێتــەلای، (عبــدالله) داوای لــە (معاویــە) کــرد موچــە بــۆ ئەوکەسانە ببڕنەوە کە لە (دیوانی موچە)دا دابڕاون‌و، بەیادی خستەوە کە هۆزی (قــوڕەیش) فەرامۆش نەکات‌و، دەستی خێرو چاکەیان بۆ درێژ بکــات‌و خزمــەتی ئــابوری‌و کۆمەڵایــەتیان پــێش کــەش بکــات، بــە جۆرێك گــوزەرانێکی ئاســودەیان بــۆ دەســتەبەر بکــات[6]. هــەروەها بــەردەوامبون‌و کۆڵنــەدانی (معاویــە) لەســـەر نیــشتەجێکردنی ســـەربازانی لـــە ناوچـــە

---

١ الادارة العسكرية (٢/٧١٩).

٢ فتوح مصر (ص: ١٠٢)، حسن المحاضرة (١/١٥١).

٣ حسن المحاضرة (٢/٣٧٨)، الادارة العسكرية (٢/٧٧٣).

٤ مروج الذهب (٣/٣٩، ٤٠)، الادارة العسكرية (٢/٧٧٤).

٥ مروج الذهب (٣/٣٩، ٤٠)، الادارة العسكرية (٢/٧٧٤).

٦ نسب قريش (ص: ٣٨٩)، الادارة العسكرية (٢/٧٧٤).

سەرسنویەکان‌و دابینکردنی خانوبەرەو زەوی‌و زاری کشتوکاڵی‌و هەڵبەستنی جۆگا بۆیان یەکێکی تره لە شوێنەواره شارستانیەتەکەی بزوتنەوەی فتوحات لە بواری ئابوری‌و کۆمەڵایەتیدا. (معاویە) فەرمانی بە سەربازە نیشتە جێکانی دورگەی (ڕودس)کردبوو کشتوکاڵ بکەن‌و مەڕو ماڵات‌و ئەسپ لەپوشوپاوانەکانیدا بلەوەڕێنن[١].

## دوازدەهەم: کەراماتی موجاهیدان لەسەردەمی (معاویە)دا ڕەزای خوای لێ بێت:

چەندین کەرامەت لە سەردەستی موجاهیدانی سەردەمی (معاویە) ڕەزای خوای لێ بێت دا ڕویانداوە، (ئەبوموسلیمی خەولانی‌و عوقبەی کوڕی عامر)بەر ڕەحمەتی خودا بکەون دوو نمونەی زیندوی کەرامەتدارانی ئەو سەردەمە بوون،هەروەك پێشتر باسمان کرد، کاتێك (عوقبە) بانگەوازی بۆ دڕندەو گیانلەبەره کێویەکانی دەڤەری (قەیرەوان) دەرکردو، داوای لێکردن کۆچ بکەن، یەکسەر بەئیزنی خودا کۆچیان کرد، ئەو لە بانگەوازەکەیدا وتی: کۆچ بکەن‌و لێره نەمێنن، ئێمە تێیدا نیشتەجێ دەبین، دوابەدوای ئەم بانگەوازە هەر یەکێکتان ببینین دەیکوژین، ئیتر خەڵك بەچاوی خۆیان دیمەنێکی سەرسوڕهێنەریان بینی، بینیان: دڕندەکان لە نێودارو درەختەکاندا دێنە دەرەوەو بێچوەکانیان بەکۆڵداداوەو گوێڕایەڵانەو بە خۆشی خۆیان کۆچ دەکەن، گورك توتکەی خۆی بەدواوەیە، مارو عەزیا بێچووەکانی خۆیان هەڵگرتوون‌و بار دەکەن، –عوقبە– کەئەمەی بینی لە نێو خەڵكدا هاواری کرد: لێیان گەڕێن با هەمویان بڕۆن، جا ئەوەی لەو جەنگەڵستانە دابوو لە گیانداری کێوی‌و دڕندەو مارو مێروو هەمووی دەرچوون‌و، خەڵکیش تەماشایان دەکردن، کاربەوە گەیشت گەرمای خۆرەتاو تینی بۆ هێنان، کە بینیان هیچی تر نایەنەدەرەوە، ئەمجا چونە نێویەوە، (عوقبە) فەرمانی پێکردن دارەکان ببڕنەوە، جا دوای ئەمە دانیشتوانی ئەفریقیا تا ماوەی (چل ساڵ)یش لە (قەیرەوان)دا نیشتە جێ ببوون تەنانەت مارێك یان دوپشکەیەك یان دڕندەیەکیان تێدا نەبینی، (عوقبە) پێشدا نەخشەی کۆشکی ویلایەتی کێشا، ئەمجا هاتە شوێنی مزگەوتی گەوره– کە بەرلەمە هیچ بینایەکی تێدا نەکرابوو– نەخشەی بۆ کێشاو دروستی کرد، هەرچەندە نوێژیان تێدا ئەنجام دەدا بەڵام خەڵك لەسەر بابەتی (قیبلە) ڕای جیاوازیان هەبوو، هاتنە سەر ئەمەو پێیان وت: هەموو دانیشتوانی (مەغریب) بە گوێرەی قیبلەی ئەم مزگەوتە قیبلە بۆخۆیان دیاری دەکەن، جا بە جیدی هەوڵی ڕاستکردنی بۆ بدە، چەند ڕۆژێك

---

١ الفتوح لإبن أعثم (٣٥٤/١)، الادارة العسكرية (٧٧٥/٢).

بەم شێوەیە مانەوەو، لە ئاسۆو هەڵاتگەی هاوینەو زستانەی خۆرو مانگو ئەستێرەکانیان دەڕوانی، بەڵام بێ سودبوو، ئیدی (عوقبە) زۆری خەفەت لەم ڕاجیاییە دەخوارد،جا لە خودای بەرزو مەزن پاڕایەوە دەروی لێ بکاتەوەو لەم دۆخەی ڕزگاربکا، لە خەونیدا یەکێك هاتە لایو پێی ووت: کە بەیانی هەستای ئاڵایەك بەدەستەوە بگرەو لەسەر شانی خۆتی دانێ، تۆ بەتەنیا گوێبیستی تەکبیر لێدانێك دەبیو کەسی تر نایبیستێ، بەدوای دەنگەکە بکەوەو بڕوانە لە کوێ کۆتایی پێهات ئا ئەوە دەبێتە قیبلەو میحرابت، خودا سەبارەت بەم سەربازگەو مزگەوتو شارە- ی دروستت کردووە زۆرت-لێی ڕازییە، لە مەولا خودا بەهۆیەوە دینەکەی خۆی بەعیززەت دەکاو، کوفری پێ زەبون دەکا، بە پەشۆکاوی لە خەوڕابوو، دەستنوێژی هەڵگرتو، چووە نێو مزگەوتەوەو دەستی بە شەو نوێژ کرد، خەڵکانی ماقوڵیشی لە گەڵ بوون، کاتێك بەیانی سپێدەیداو لە جەماعەت بوونەوە، دەنگی (ألله أکبر) لە پێشیەوە بەرز بۆوە، بەخەڵکی دەوروبەری وت: ئەوەی من دەیبیستم ئێوەش دەیبیستن؟ وتیان: نەخێر، جابۆی درەکەوت کە ئەم شتە لە خواوەیە، ئاڵاکەی لە سەرشانی داناو بەدوای دەنگی (ألله أکبر) ەکە کەوت،کاتێك گەیشتە شوێنی میحرابەکە دەنگەکە کۆتایی پێهات،ئەمجا خەڵك لە هەموو ئاسۆکانڕا بۆ دەرەوەی دا بارینو هێندەی تر ڕێزو گەورەیی بۆ زیاد بوو، ...(عوقبە) چاکترین (والی)و باشترین (فەرماندە) بووو، دوعاگۆبوو[١].

پەندێکی یەجگار کاریگەر لەم بەسەرهاتەدا هەیە دیارە کاتێك (عوقبە) بانگی دەعباو دڕندەومارو مێروەکانی کردو گوێڕایەڵیان ئەنجام داو کۆچیان کرد،ئەمە تەنها کەرامەتێکی خودای پەروەردگارەو، هەر کاتێك ویستی لەسەر ئەوە بێ بەهۆی دۆستەکانی خۆیەوە ئیسلام سەربخاتو بەسەر زەویدا پەخش بکات، ئەوا لەڕێی بەخشینی ئەم جۆرە کەرامەتانەوە ڕێز لە دۆستەکانی خۆی دەنێ، تەماشاچۆن دەنگی (عوقبە)ی بەگوێ دادانو سامو هەیبەتی ئەوی خستە دڵیانەوە،وای لێکردن وەك ئەوە پێشتر ئاقڵو فامیان هەبووبێ ئاوا گوێڕایەڵو فەرمانبەرداری بنوێنن، وەك (إبن الأثیر) دەگێڕێتەوە: خەڵکێکی زۆری نەتەوەی (بەربەر) ئەم ڕوداوەیان بینیو بەهۆیەوە موسڵمان بوون[٢].... چەند لێکۆڵەرێك گوتویانە ئەم هەواڵە یەکێکە لەو ئەفسانانەی ڕیوایەتکەرەکان دەربارەی عوقبە

---

١ البیان المغرب في أخبار الأندلس والمغرب (١/١٩-٢١)، الکامل في التأریخ (٢/٤٨٤)، فتوح مصر (ص: ١٣٣)، ڕیوایەتەکە (صحیح الاسناد)ە.

٢ فتوح مصر (ص: ١٣٣)، التأریخ الاسلامي (١٣/٢٤٩).

هەڵیانبەستون، هۆکاری هەڵاتنو ڕۆیشتنی دەعبا کێویو دڕندەو مارو مێروەکانیشیان لەو شوێنە بە خۆیانو بێچووەکانیانەوە بۆ ئەوە گێڕاوەتەوە کە گوایە، لە دەنگە دەنگو ژاوەو هۆسەی سوپای ئیسلامی ترساونو بەناچاری ئەوێیان بەجێ هێشتووە، ئەم لێکدانەوە یەکێکە لەوشتە سەیرانەی هەندێك لێکۆڵەر کە بەخاتری ڕەتکردنەوەی ئەوشتەی ئەقڵ بەتەنها نایگرێ، ویستویانە خۆ لە بیرکردنەوەی ڕاستو دروست بدزنەوە، هەروەك چۆن خۆیان لە ئاقار هەموو ئەو مێژوو نوسانەش بێ ئاگا دەکەن، کە ئەم ڕوداوەو زۆر لە وێنەی ئەم ڕوداوانەیان نوسیونەوەو بڕوایان وابوە ئەمانە شتگەلێکن لە عادەتبەدەرن، ئەوان ئەم مێژونوسانە بەسادەو فامکاڵ تۆمەتبار دەکەنو پێیان وایە دەستکاری ڕوداوە ئاساییەکانیان بە شێوەیەك کردووە کە لە شێوەی ئەفسانەدا دەرکەون، بێگومان بە گوێرەی بیرکردنەوەی ڕاستو دروست ئەو لێکدانەوەی ئەوان سەبارەت بە ئەمە پشتیان پێ بەستووە،لە گەڵ ئەقڵی ساغو سەلیم ڕێك ناکەوێ، چونکە هەرکاتێك گیانلەبەرە کێویو وشکانیەکان هەستی مەترسی بکەن بەخاتری ئەوە توشی ئەزێتو ئازار نەبن پەنا بۆ هەڵاتنو خۆ دەرخستن نابەن، بەڵکو هەوڵی خۆشاردنەوە دەدەنو پەنا بۆ کونو حەشارگە ئەمینو ئەمانەکانیان دەبەن، خۆئەگەر بە پێچەوانەی نەریتی گشتی جەنگڵستان جوڵابنەوەو بڵێین بەئاساییو لە ترسی سوپای ئیسلام لە کونەکانی خۆیان هاتونەتە دەرەوەو ڕایانکردووە، ئەو کاتە هیچ واتایەك بۆ ئەوهەموو سەرسوڕمانە نەدەمایەوە کە بەربەرەکان توشی هاتنو هەڵینان بچنە نێو ئیسلامەوە، ئەو هەموو مێژونوسانەش نەدەهاتن ئەوا بە بایەخپێدانەوە بیگێڕنەوە، لە یەکێك لە ڕیوایەتەکاندا: (إبن عبدالحكم) لە (ليث بن سعد)ەوە دەگێڕێتەوە (زیادی کوڕی عجلان) قسەی بۆکردم: چل ساڵ دوای ڕودانی کە ڕامەتەکە دانیشتوانی (ئەفریقیا) لەوێ – واتە لەقەیرەوان– دا نیشتەجێ بوون، ئەگەر لەم ماوەیەدا مارێك یان دوپشکەیەك هەزار دیناری لە بەرانبەر دانرابایە دەست نەدەکەوت[1]. پەندێکی تر لەو خەونەدا هەیە کە (عوقبەی کوڕی نافیع) سەبارەت بەدیاریکردنی قیبلەی مزگەوتەکەی قەیرەوان بینیو گوێبیستی دەنگی ئەو (تەکبیر)ە بوو کە کەسانی دەوروبەری نەیاندەبیست، بێگومان ئەمەش کەڕامەتێکی تر بوو خودا بەم دۆستە صاڵحەی خۆی بەخشیو،بەهۆیەوە موسڵمانانی لەو کێشەو تەنگەبەرە ڕزگار کرد، کەبەهۆی بێ دەسەڵاتیان لە بەرانبەر دیاری کردنی قیبلە بەشێوەیەکی ڕاستو دروست ڕوی تێ کردبوون. بێگومان دەرکەوتنی کەڕامات لەسەر

---

١ فتوح مصر (ص: ١٣٣)، التأريخ الاسلامي (١٣/٢٤٩).

دەستی دۆستە چاكو پاكەكانی خودا بە خاتری مەبەستگەلێكی پیرۆز دێنە دی، دەربازبونی موسڵمانانیش لە تەنگژەیەكی ئاوا لەم شێوەیە یەكێكە لەو مەبەستە پیرۆزانەی دەركەوتنی كەرامەت، (عوقبەی كوڕی نافیع) دوعاگۆ بوو، جا خودای بەرزو بەخشندە دوعاكەی لێ قبوڵ كردو سەبارەت بەبابەتی زانینی قیبلە خەمو مەراقی خۆیو موسڵمانەكانی ڕەواندەوە[1]. (ئەهلی سوننەتو جەماعات) ڕودانی كەرامەت لەسەر دەستی دۆستانی چاكو پاكی خودا دەسەلمێنن: دۆستانی خودا بریتین لە تەقواكاران، ئەوانەی شوێنپێی ڕێبازی (محمد)(ﷺ) هەڵدەگرن، هەرشتێك خودا فەرمانی كردنی دەركردبێ ئەنجامی دەدەنو، لە ئەنجامدانی ئەو شتانەش سڵ دەكەنەوە كە قەدەغەی كردون، هەرشتێكیان بۆدەركەوێ كە پێغەمبەر (ﷺ) كردویەتی ئەوانیش ئەنجامی دەدەن، جا خودا بەهۆی فریشتەكانیو جبریلەوە پشتیوانییان لێ دەكاو، ڕوناكاییان دەخاتە نێو دڵو دەرونەوە، دەبنە خاوەن كەرامەتێك كە خودا بە هۆیانەوە ڕێز لە دۆستە تەقوا كارو باشو هەڵبژاردەكانی خۆی دەنێ، دەركەوتنی كەرامات لەسەر دەستی ئەوان (هەروەكو موعجیزاتی پێغەمبەر (ﷺ) تەنها بۆ جێبەجێكردنی پێویستیەك لە (دین)دا، یان پێویستیەكی موسڵمانان دێتە دی، ئەمە لە حاڵەتێكدا كە كەراماتی دۆستانی خودا بە بەرەكەتی شوێنكەوتنی پێغەمبەری خوا (ﷺ)ەوە دەست دەكەون[2]. پێویستە ئەوەش بزانرێ كە جار هەیە كەرامەت بە گوێرەی پێویستی كەسەكە دەبێ، ئەگەر كەسێكی ئیمانلاواز یان هەژار پێویستی پێ بوو، ئەوا ئەوەندەی – لە كەرامەت– پێ دەبەخشرێ كە ئیمانەكەی پێ بەهێز بكا، یان پێویستیەكەی پێ جێبەجێ بكا، بۆی هەیە كەسێكی تر هەبێ لە ڕوی پلەی ویلایەت– دۆستایەتی خوا– وە لە ئەو كامڵتر بێ، بەڵام پێویستی پێ نییەو بەهۆی بەرزی پلەی دەوڵەمەندبوونیەوە ،نەك لەبەر ئەوەبە پلەی ویلایەت نەگەیشتبێ، كەرامەتێكی لەو جۆرەی بۆ نەیا، كە بۆ ئەو كەسەی پێشدا هاتبوو، هەر لەبەر ئەمەشە ئەو كەرامەتە زۆرەی لە سەردەستی تابیعەكان ڕویانداوە ئەوەندە لەسەر دەستی هاوەڵان ڕویان نە داوە[3]. (باوەڕبون بە كەراماتی دۆستانی خودا) بڕگەیەكە لە بڕگەكانی عەقیدەی ئەهلی سوننەتو جەماعەت[4].

---

١ التأريخ الاسلامي (١٣/٢٤٩).

٢ مجموع الفتاوى (١١/٢٧٤).

٣ المصدر نفسه (١١/٢٨٣).

٤ الإنحرافات العقدية والعلمية (١/٥٠٨).

## سێزدەهەم: ( حەکەمی کوڕی عەمروی غەفاری )و دابەشکردنی دەستکەوتەکانی جەنگی چیای ( ئەشل ) لە ( خۆراسان ):

.... (عبدالرحمن کوڕی صبح) دەگێڕێتەوە: لە گەڵ (حەکەمی کوڕی عەمرو) لە (خۆراسان) بووم، (زیاد) بۆ(حەکەمی) نوسی: چەکی دانیشتوانی چیای (ئەشل) بریتیەلە بۆسەنانەوە، قاپو قاچاغیان لە زێڕ[1] دروستکراون، ئەمجا لەگەڵیان کەوتە جەنگەوە، کاریەوەگەیشت دۆڵو ڕێبازەکانیان گرتن، گەمارۆیانداو، تەنگیان پێ هەڵچنی، شپرزەبوو و دەستە پاچە ڕاوەستان، (موهەلەب) جڵەوی جەنگەکەی بە دەستەوە گرت، بەردەوام خەریکی فێڵ بوو، تا لە ئەنجامدا سەرکردەیەکی گەورەی لێ گرتن، جا پێی وت:یەکێك لەم دوشتانە هەڵبژێرە: یان لەم تەنگەژە دەربازمان دەکەی، یان دەتکوژم، پێی ووت: لە نێوەڕاستی ڕێگایەکدا ئاگر بکەوە، ئەوان خۆیان کۆدەکەنەوەو هەموو ڕێگاو گردوشیوەکان چۆڵ دەکەنو بەرەوئاگرەکە دێن، ئەوکاتە پێچ بکەنەوە بەلایەکی تردا بڕۆن، خەمتان نەبێ دەردەچنو پێتان ناگەن، جا ئەمەیان ئەنجامداو، ڕزگاریان بووو غەنیمەتێکی زۆرو زەوەندیشیان دەستکەوت[2]. (عبدالرحمن ی کوڕی صبح) وتی: (زیاد) لە نامەیەکیدا بۆ (حەکەم)ی نوسیبوو: وەڵاهی ئەگەر بۆت بمێنم دەبێ ئەندامێکی حەڕامت لێ کەمەوە[3]. بەر لە ئەم- هەڕەشەیە- هەواڵی پێگەیشتبوو کە (حەکەم) چ دەسکەوتێکی دەستکەوتووە، بۆی نوسیبوو: ئەمیری ئیمانداران بۆی نوسیوم کە هەرچی (زەردو سپی)[4] ومالێکی نایابو نازدارو سەرنج ڕاکێشە بۆ ئەوی هەڵبژێرم، هەتا ئەم شتانەی لێ دەرنەکرێ، دەست لەیەك شتی ئەم دەسکەوتە نەدەیو نەیبزوێنی، (حەکەم) بەنامە وەڵامی دایەوەو: نوسی: پاش ئەمە: نامەکەت گەیشت، دەڵێی کە ئەمیری ئیمانداران بۆی نوسیومو فەرمانی پێکردم هەرچی زەردو سپیو نایابە بۆی جیاکەمەوەو- پێم دەڵێی-: یەك شتی لێ نەبزێوی!، جا - بزانە- نامەی خودای بەرزو مەزن لە پێش نامەی ئەمیری ئیماندارانەوەیە، وەڵاهی ئەگەر

---

١ بەلگەیە لەسەر زەنگینیان.

٢ الكامل في التأريخ (٢/٤٧٦).

٣ واتە: ئەو سەروەتە پیسەت لەنێو دەبەم کە بە حەڕامی داگیرت کردووە.

٤ زەردو سپی، واتە: زێڕو زیو.

هەر حەوت تەبەقی ئاسمانو زەوی لەدژی بەندەیەك تـەقوای خـودای بەرزومەزن بکا وێك بێنەوەو لێك بدەن، ئەوا خوادی بەرزو بێ خەوش دەروویەکی خێری لێ دەکاتەوە، ئـەمجا بـە خەڵکی گوت: وەرن بەیانی بەشەدەسکەوتی خۆتان وەربگرن، پێنجیەکی لێ جیـا کـردەوەو، ئەمجا ئەوەی مایەوە بەسەریدا دابەش کردن، (عبدالرحمن) وتی: جا (حەکەم) وتی: یاڕەببی خودایەئەگەر هیچ خێرێکم لەلای تۆهەیە بۆخۆتم بەریەوە، ئیتر هێندەی نەبرد لـە (مـەروە)ی سەر بە(خۆراسان) کۆچی دوای کرد[1].(ابـن عبـدالبر)[2] و (إبـن الجـوزی)[3] و (إبـن الأثـیر)[4] و (إبـن کثیر)[5] ئەم هەواڵەیان باسکردووەو، هەرهەموویان سەبارەت بە ئەوە کە معاویـە ڕەزای خـوای لێ بێت داوای جیاکردنەوەی زێڕو زیوی نێو دەستکەوتەکەی کردبێو فەرمانی کردبـێ بەسـەر سوپای غەزاکەردا دا بـەش نـەکرێ، یەکدەنگن، بـەڵام ئـەم (ڕیوایەتـە) بـە هـیچ سـەنەدێکی صەحیح– و ڕاستو دروست– نەهاتووەو، لە گێڕانەوەکەی (إبن کثیر)دا ئەم زیادە هـاتووە: (معاویە) ڕەزای خوای لێ بێت داوایکرد زێڕو زیوەکە بۆ (بەیتولماڵە– دارایـی گشتی) ڕەوانـە بکرێت[6]. جێی بەبیرهێنانەوەیە کە خودای بەرزو مەزن لـەم ئایەتـەدا چۆنیەتی دابەشـکردنی دەسـکەوتەکانی جـەنگی باسـکردووە: ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ﴾[7]. ئەمـە ئـەوە دەگەیـەنێ چـوار لەسـەر پێنجی دەسکەوتەکان بەسەر سوپای غەزاکـەردا دابـەش دەکرێتو، ٥\١ەکـەی تریـشی بـەو جۆرە دابەش دەکرێ کە خودا بەپێی دەقی ئایەتەکە بڕیاری لە سـەرداوە:واتـە: بـۆ (خـودا، پێغەمبـەر، خزمـانی پێغەمبـەر، ئەوانـەی زەکاتیـان پێـی نـادرێ–، هـەتیوان، هـەژاران، ڕێبواران)،–بەڕای ئێمە–: ئەم حوکمە بەلای (معاویە) ڕەزای خوای لێ بێت نادیدە نـەبووەو،

---

١ تأريخ الطبري (٦/١٦٧).

٢ الاستيعاب (١/٣٥٧).

٣ المنتظم (٥/٢٣٠).

٤ الكامل في التأريخ (٢/٤٧٦).

٥ البداية والنهاية (١١/٢١٧).

٦ البداية والنهاية (١١/٢١٧).

٧ سورة النفال(٤١).

(دینو عەدالەت)ە کەشی ڕێیان پێ نەداوە حوکمی خودای پاکو بەرز ڕەت بکاتەوە[١].

بەگوێرەی ڕیوایەتەکەی (الطبري): لەگەڵ ئەوەدا حوکمی شەرع سەبارەت بەم بابەتە ڕوون بوو بەڵام (حەکەمی کوڕی عەمرِوی غەفاری)ڕەزای خوای لێ بێت یەکسەر دەسکەوتەکانی دابەش نەکردبوون، بەڵکو سەبارەت بەئەمە چەند جار نامە گۆڕینەوە لەنێوان ئەوو (زیاد)داڕوویداوە، درەنگدابەشکرانی ئەم دەسکەوتانە سرنجمان بەلای چەند ئەگەرێکدا ڕادەکێشێ، کە دەکرێ لە میانەی ئەمەدا گومانەکانی نێو ڕیوایەتەکەی پێ بڕەوێنێتەوە: ئەگەرەکانیش ئەمانەن:

١- لەوانەیە (معاویە) ڕەزای خوای لێ بێت داوای یەك لەسەر پێنجی دەستکەوتەکانی کردبێ- لە زێڕو لەزیو- کە مافی پێشەوای موسڵمانانە سەرپەرشتی دابەشکردنی بکات.

٢- لەوانەیە (معاویە) پێی چاك بوبێ زێڕو زیوو سامانە نایەبەکانی دەستکەوتەکە پێش دابەشکرانیان بۆ هیندستان بەڕێ بکرێنو لەوێ بەنرخێکی باش بفرۆشرێنو[٢]. ئەمجا نرخەکەی بکرێتە پێنج بەشو دابەش بکرێ، ئەمەش خێرێ هەموو لایەکی تێدایە[٣].

٣- پێ دەچێ لەو کاتەدا (بەیتولماڵە-دارایی گشتی) کەمو کورتیەکی وەختی بەسەردا هاتبێ، جا (معاویە) ویستبێتی ئەو دەستکەوتانەی سوپاکەی (حەکەم) بۆ کاتێکی دیاری کراو بە قەرز وەربگرێتو، دابەشکرانی دەستکەوتەکان بەسەر سوپاکەدا بۆ ماوەیەکی تر دوابخات.[٤]

-ئەگەر ڕیوایەتەکە گریمان ڕاست دەربچێ- چەند وانەیەکی گرنگو بەسودی لێ وەردەگرین: پابەندبونی (حەکەمی کوڕی عەمرِوی غەفاری) بە مەبدەئی ١- (لاطاعة لمخلوق في معصية الخالق)= لەسەر حیسابی سەرپێچی کردنی فەرمانی خودای (خالق) فەرمانبەرداری فەمانی بەندەی (مەخلوق) ناکرێ ٢- (وأدو الأمانات إلى أهلها) ، واتە:

---

١ مرويات خلافة معاوية في التأريخ الطبري (ص: ٣٥١، ٣٥٢)، ئەم بڕگەیە بە تەواوەتی لەو کتێبە بە نرخەدا هاتووە.

٢ (د. خالد الفيث) باسێکی گرنگی سەبارەت بە بابە تی (الغنائم والحكم بن عمرو الغفاري) نووسیوە، منیش ئەمانەم لە ئەو وەرگرتوون، بڕوانە: خلافة معاوية في تأريخ الطبري (ص: ٣٥٢).

٣ مرويات خلافة معاوية في التأريخ الطبري (ص: ٣٥٢).

٤ هەمان سەرچاوە (ص: ٣٥٢).

سپاردەکان بۆ خاوەنەکانی خۆیا بگێڕنەوەو خاوەنی دەستکەوتەکانیش سەربازانی بەشداربوی غەزاکە بون، ئیتر ئەو یەك شتی لەو سامانە پاشقول نەداو دوای جیاکردنەوە(پێنجیەك)ەکەی هەموی بەسەر سوپاکەدا دابەشکرد[1]. ئەمانەی ڕابوردن: بریتی بون لە گرنگترین ئەو وانەو پەندو سودانەی لە فتوحاتی سەر دەمی (معاویە)وەردەگیرێن.

## چواردەهەم: شەهیدبوونی (صلەی کوری أشیم)و کوڕەکەی لە (سوجستان)٦٢ك:

(صلةی کوری أشیم)، ناسراو بە (أبو الصهباء ی کوڕی عەدەوی بەسرِی)ی، خودا پەرستی دنیا نەویستی پێشەنگ، شوی (موعاذەی عەدەویە)ی ژنە زانا، خاوەنی ژمارەیەك هەلوێستی جوامێرانەو کاریگەر بوو،(ثابت) دەڵێ: یەکێك هاتەلای (صلة)و سەرەخۆشی مەرگی براکەی لێ دەکرد، پێی وت: لێم نزیك بەرەوە، لە مێژە خودا سەرەخۆشی ئەمەی لێ کردوم،خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ﴾[2]. واتە: ڕاستیەکەی تۆ دەمریو ئەوانیش هەر دەمرن، خاوەنی ژمارەیەك (کەرامەت)یشە: (حمادی کوڕی جعفری کوڕی زیاد) دەڵێ: باوکم هەواڵی دامیو وتی: لە غەزایەکدا بەرەو (کابول) ڕۆیشتین، (صلة)ش لەنێو سوپاکەدا بوو، لە شوێنێك دامەزراینو، وتم: وەڵاهی دەبێ چاودێری بکەم داخۆ چ دەکا، نوێژی کردو پاڵی دایەوە، کشومات بونی خەڵکی قۆستەوەو، هەستاوڕۆیشتو، خۆی بەنێو بیشەلانێکدا کرد، دورو نزیك بەدوای کەوتم، دەستنوێژی هەلگرتو دەستی بە نوێژکردن کرد، ئەمجا شێرێك هاتو لێی نزیك بۆوە، من چومە سەر دارێك، شێرەکە بەدەوریدا پێچی دەخوارد، (صلة) خۆی تێك نەداو چووە سوژدەوە،– لەدڵی خۆمدا– گوتم: هەر ئێستا قەپی پێدا دەکاو دەیکاتە نێچیری خۆی، لە سوژدە هەستایەوەو دوای خوێندنی تەحیات سەلامی دایەوە، ئەمجا ڕوی کردە شێرەکەو پێی وت: هۆ درندە: بۆ پەیداکردنی ڕزقو ڕۆزی بۆ شوێنێکی تر بچۆ، جا ڕۆیشتو بە شێوەیەك دەینەڕاند،دەمگوت: لەوانەیە شاخەکە بەهۆیەوە بروخێ، کاتێك بەیانی داهات، دانیشتو بەجۆرێك سوپاسو ستایشی خودای کرد

---

١ هەمان سەرچاوە (ص: ٣٥٢).

٢ سورة الزمر (٣٠).

کەتائەو کاتە وێنەی ئەمەم نەبیستبوو، ئـەمجا وتـی: خودایـە داوات لێ دەکـەم لـە بەرانبـەر ئاگری دۆزەخ چەپاڵەم بدەی، وێنەی من چـۆن جورئـەت دەکـا داوای بەهەشـتت لێ بکـا؟![1].

(عەلائی کوڕی هلال) دەڵێ: پیاوێك بە (صلة)ی وت: ئەی (ئەبو سـەهبا): لـە خەونمـدا شـانە هەنگوینێکیان دا بەمن‌و، دوشانەشـیان دا بـەتۆ، (صـلة) وتـی: تـۆو مـن‌و کوڕەکـەم شـەهید دەبین، ئەمەو لەو ڕۆژەدا سوپای ئیسلام بەسەرکردایەتی (یزیـدی کـوڕی زیـاد) لـە بەرانبـەر سوپای (تورك)لە (سوجستان) تێك شکا، (صلة) بەکوڕەکەی خۆی گوت: ڕۆڵە گیان بگەڕێوە بـۆلای دایکـت، وتـی: باوکـە بـەس خێـرت بـۆ خـۆت دەوێ‌و، فـەرمان بـە مـن دەکـەی بگەڕێمەوە؟!، وتی: کەواتە بەرەوپێشەوە هەنگاو بنێ، هەنگاو بنێ، جا دەستی بە کوشـتار کرد تا پێکرا، (صـلة)ی بـاوکی – تـیر هاوێـژ بـوو– بـەتیر بـەرگری لـە تەرمەکـەی کـردو، – تورکەکانی– لە دەورە تەکاندنەوە، بەرەو پێشەوە ڕۆیشت‌و لەسـەر سـەری ڕاوەسـتا، زۆری بۆ لە خودا پاڕایەوە، ئەمجا ئەویش خۆی بـەنێو گۆڕەپـانی جەنگدا کردو،تـا شـەهید نـەبوو کۆڵی نەدا[2].(حمادی کوڕی سەلەمە) دەڵێ: (ثابـت) هـەواڵی پێـداین: کـە (صـلة) لـە جەنگدا بووو کوڕەکەشی لە گەڵدا بوو،جا بەکوڕەکەی وت: ڕۆڵـە گیـان یـاڵڵا بـەرەو پێـشەوە بـڕۆ، جەنگ بکە تا دەبی بە پێشبارەی قیامەتی من، جا هەڵمـەتی بـردو، جـەنگێکی قارەمانانـەی کـردو پاشـان کـوژرا، ئـەمجا (صـلة)ش بـەرەو پێـشەوە ڕۆیـشت‌و کـوژرا، ژن لـە دەوری (موعـاذە)ی هاوسـەری کۆبونـەوە، (موعـاذە) وتـی: ئەگـەر بـۆ پیرۆزبـایی لێکـردنم هـاتوون بەخێربێن، ئەگەر بۆ شتێکی تریش هاتونەتەلام بگەڕێنـەوە[3]. ئـەم داسـتانەی (صـلة)ی تێـدا شەهید بوو لە ساڵی ٦٢ك یدابوو[4].

---

١ سير أعلام النبلاء (٣/٤٩٩).

٢ سير أعلام النبلاء (٣/٥٠٠)، رجاله ثقات.

٣ طبقات إبن سعد (٧/١٣٧)، سير أعلام النبلاء (٣/٤٨٩).

٤ سير أعلام النبلاء (٣/٥٠٠).

# باسی پێنجەم
# ویلایەتی عەهدو، کۆچی دوایی معاویە ڕەزایی خوای لیٚ بێت
## یەکەم: سەرهەڵدانی بیری بەیعەتدان بە (یەزید)

زۆرێك لە توێژەران ئۆباڵی بەیعەتدان بە (یەزیدی کوڕی معاویە) دەخەنە ئەستۆی (موغیرەی کوڕی شوعبە)، چونکە – (ئەو)– بە بۆ چوونی ئەوان – تەگبیر کەرو هەڵێنەری ئەم بیرە یەو، بۆ ئەم مەبەستە سەردانی (معاویە)ی کردووەو پێشنیاری پۆستی خیلافەتی یەزیدی لە دوای خۆی بۆ خستبووە ڕوو، بەڵێنی پێدابوو،کە بانگەشە کردن بۆ (یەزید)و سازکردنی دانیشتوانی (کوفە) بۆ قبوڵکردنی هەواڵی دیاریکرانی (یەزید) بۆ (ویلایەتی عەهد) لە ئەستۆی خۆی دەگرێ، هەموو ئەوانەی (موغیرەی کوڕی شوعبە) بە ئەمە تۆمەت بار دەکەن، ئەم تاکە بەڵگە لاوازەیان بەدەستەوەیە کە هەندێك لە سەچاوەکۆنەکان گێڕاویانەتەوە، بەپێی ئەم ڕیواتەیە: (موغیرەی کوڕی شوعبە) ڕەزای خوای لێ بێت دەچێتە لای (معاویە)و داوای لێ دەکا ئیستیقالەی پۆستی ویلایەتی (کوفە)ی لێ قبوڵ بکا، ئەویش لێ ی قبوڵ دەکاو لە سەر پۆستەکەی لادەبا، دوایە (معاویە) دەیەوێ (سعیدی کوڕی عاص) بخاتە جێگاکەی، یەکێك لە پیاوەکانی (موغیرە) ئەم هەواڵە بە (موغیرە) ڕا دەگەیەنێ، ئەویش لەو دەمەدا هەستی دەوروژێو، حەزدەکا پۆستەکە وەربگرێتەوە، هەڵدەستێو دەچێتە لای (یەزید)و پێشنیاری (بەیعەتدان بەئەوو ویلایەتی عەهد) ی بۆ دەخاتە ڕوو، یەزید پێشنیارەکەی (موغیرە)بۆ باوکی باس دەکا، جا (معاویە) (موغیرەی کوڕی شوعبە) بانگ دەکاتو فەرمانی پێ دەکا جارێکی تر بە (والی) بۆ (کوفە) بگەڕێتەوەو، کار بۆ بابەتی بەیعەتدان بە (یەزید) بکات[1]. هەرچی زنجیرە سەنەدی ئەم ڕیوایەتەیە زەعیفو لاوازەو، بە خاتری ئەمە ناکرێو نابێ بە هیچ شێوەیەك دڵ بە نێوەڕۆکەکەی خۆش بکرێتو قبوڵ بکرێت، لەلایەکی ترەوە دەبێ ئەو ڕاستیە بزانرێ کە: (موغیرە) ڕەزای خوای لێ بێت هاوەڵێکی گەورەیەو هیچ کە لە ساڵی ٥٠کۆچیدا[2] و بەر لە دەرکەوتنی بیری ویلایەتی عەهد لە لای (معاویە) کۆچی دوایی کردووە، بەڵکو سەرەتای سەرهەڵدانی لە سەردەمی ویلایەتی (زیاد بن أبیه) بەسەر (عێراق)ەوە بووەو، (الطبري) یش بەڕاشکاوی دەڵێ: (معاویە) تەنها

---

١ الأشراف في منازل الأشراف لإبن أبي الدنيا (ص: ١٢١)، إسناده ضعيف، تأريخ الطبري (٦/٢٢٠)، إسناده ضعيف جداً، تأريخ الذهبي–حوادث (٦١ـ٨٠هـ)، (ص: ٢٧٢) إسناده ضعيف جداً.

٢ تأريخ الطبري (٦/١٥٠).

لەساڵی ٥٦ی کۆچیدا بانگەشەی بەیعەتدان بۆ (یەزید) دەستپێکردووە [١]. جا کەواتە ئەگەر (موغیرە) هەڵێنەری ئەم بیرەو ڕێخۆشکەری قبوڵکردنی بوبێ لە پێش مەرگیدا، لە بەرچی ئەو هەموو ماوە زۆرە دواکەوتو دوای هەموو ئەم ساڵانە سەری هەڵدا؟! [٢].

## دووەم هەنگاوەکانی (معاویە )بۆ بەیعەتدان بە (یەزید).

١- پرس‌وڕاوێژ: لە هیچ کامێك لەسەر چاوە مێژووییەکان بەسەر ئەوەدا نە کەوتوین کە معاویە لەچ کاتێکەوە بەلێبڕاوی بیری لەوە کردبێتەوە کە (یەزید) لە دوای مەرگی ئەو ببێتە خەلیفەی موسڵمانان، بەڵام بە دڵنیایی دەزانین کە تەنها لە دوای ساڵی (٥٠)ی کۆچی ئەمەی بە زەیندا هاتووە، واتە: پاش چۆڵبونی گۆڕەپان لە بوونی ئەو هاوەڵە گەورانەی موژدەی چونە بەهەشتیان پێدرابوو، وەك (سعدی کوڕی ئەبی وقاص‌و سعیدی کوڕی عەمرو)و پاش کۆچی دوایی (حەسەنی کوڕی عەلی) خوا لەهەموویان ڕازی بێتو، دوای ئەوەش کە (یەزید)ی لە میانەی سەرکردایەتیکردنی ئەو سوپایە دا ناسی کەگەمارۆی (قوستەنتینیە)ی دابوو، ئیتر دوای هەموو ئەمانە (معاویە) زەمینەی دیاریکردنی (یەزید)ی بۆ پۆستی (خیلافەت) لە دوای خۆی خۆش دەکردو، زۆر سروشتیو ئاسایی بوو سەبارەت بەئەمە پرس بە (زیاد بن أبیە)ی بکا، بەتایبەتی دوای ئەوە ببوو بە بابرایو بە ناوی (زیادی کوڕی ئەبی سوفیان)ەوە بانگ دەکرا و، ویلایەتی عێراقی پێ سپاردبوو. بالێرەداو دەربارەی ئەم پرسو ڕایە گوێ لە ڕیوایەتەکەی (الطبري) بگرینو، بزانین (زیاد) چی کردووەو چی وتووە؟ (الطبري) دەڵێ: کاتێك (معاویە) ویستی بەیعەت بۆ (یەزید)وەربگرێ، نامەی بۆ زیاد نوسیو ڕاوێژی پێ کرد، جا (زیاد) بەدوای (عوبەیدی کوڕی کەعبی نەمیری)یدا ناردو وتی: هەر ڕاوێژ پێکراوێك متمانەی لەسەرەو، هەر ڕازو نهێنیەکیش شوێنی ئەسپاردە کردنی خۆی هەیە، خەڵك دوو نەریت زیانی پێگەیاندوون: بڵاو کردنەوەی نهێنیو دڵسۆزی نواندن بۆ غەیری خاوەنی سپاردەکە، تەنها یەکێك لەم دوانە شیاوی ئەوەیە نهێنی پێ بسپێردرێ: پیاوێکی قیامەتی کە ئومێدی بە پاداشت- ی خوابێ-، پیاوێکی دونیایی کە دارای نەفسێکی بەرزو ئاقڵێکی وابێ کەسایەتی خۆی پێ بپارێزی، ئەم دوو سیفەتەم لە تۆدا بەدی کردونو دڵم بە لای تۆ ئاو دەخواتەوە، بۆیە بۆ شتێکم بانگهێشت کردووی کە پێم وایە دوتوێی کتێبو نامە

١ تأريخ الطبري (٦/٢١٩)، مواقف المعارضة في خلافة يزيد بن معاوية (ص: ٨٤_٨٧).

٢ مواقف المعارضة في خلافة يزيد بن معاوية (ص: ٨٧).

ناپیارێزێتو ئاشکرای دەکەن، ئەمیری ئیمانداران بۆی نوسیوم: کەئەو پێی ی وایە بڕیاری داوە بەیعەت بۆ (یەزید) وەردەگرێ، ئەو هەم لە ناقایلی خەڵك دەترسێتو هەم هومێدەوارە دانی پێدا بێنن، ئیستا داوای لێکردوم ڕازی خۆمی پێ ڕابگەیەنم، شتێك پەیوەندی بە کاروباری ئامانجی بەرزی (ئیسلام)و پاراستنو بەرقەرارکردنیەوە هەبێ شتێکی بەجگار گەورەو سامناکە، (یەزید)تەنبەڵی ڕەچا کردووەو، بایەخ بەشت ناداو، لە گەڵ ئەوەدا کە خوی بە نێچرەوانیشەوە گرتووە، جا بچۆ بۆلای ئەمیری ئیمانداران‌و ڕای منی پێ بگەیەنەو، هەواڵی کردارە نەشیاوەکانی (یەزید)ی بۆ ڕون بکەرەوەو، پێی بڵێ: شیاو ترین شت ڕەچاوی بکەی تا چت مەبەستە بۆت جێبەجێ بێ، ئەوەیە لەمەدا مۆڵەتێك وەبگریو پەلەنەکەی: چونکە درەنگوەخت بە مەبەست بگەی لەوە باشترە پەلە بکەیو هیچت دەستگیر نەبێ، (عوبەید) وتی: نەدەبو ڕایەکی ترت هەبێ؟ (زیاد)وتی: ئەوڕایە چیە؟ وتی: لە (معاویە) گەڕێو ڕاو بۆچونەکەی لێ تێك مەدە، (یەزید)ی کوڕی بەلاوە مەبوغزێنە، من بەبێ ئەوە (معاویە) پێ بزانێ لە گەڵ (یەزید) کۆدەبمەوەو، پێی دەڵێم کە: (ئەمیری ئیمانداران سەبارەت بە بەیعەتوەرگرتن بۆ تۆ نامەی بۆ (زیاد) نوسیوەو، داوای لێ کردووە ڕای خۆی بۆ دەربڕێ، بەڵام (زیاد) دەترسێ بەهۆی هەندێك کرداری نادروستەوە خەڵك ڕقیان هەڵبستێو سەرپێچی بنوێنن، بۆیە ڕای وایە واز لە هەموو ئەو ڕەفتارانەت بێنی کە خەڵك ڕقیان پێ هەڵدەستێ، ئەگەر وات کرد، ئەوا ئەمیری ئیمانداران بەڵگەی لە بەرانبەر خەڵکدا پێ دەبێو بڕیارەکەی بۆ دادەمەزرێو، تۆش دوایە چ شتێکت بوێ بەئاسانی بۆت جێبەجێ دەبێ).، بەم جۆرە هەم ئامۆژگاری (یەزید) دەکەی و هەم (ئەمیری ئیمانداران)یش ڕازی دەکەیو، ترست لە بەرانبەر تێکچونی بارو دۆخی کارو باری (ئوممەت)یشدا نامینێ،(زیاد) وتی: بە بەردی خۆی نیشانەت پێکا، لەسەر بەرەکەتی خودا بڕۆ، ئەگەر ڕایەکە دروست بوو و پێکات ئەوە ڕەخنەی لێ ناگیرێ، ئەگەر نادروست بێو نەیپێکا ئەوە لە نادڵسۆزیەوە نیە، (إنشاء الله ) لە نەپێکان بەدور دەبی، وتی: (تۆ چت پێ چاکە ئەوە دەڵێیو، خوداش بڕیار لە سەر ئەو شتە شاراوەیە دەدا کە خۆی دەیزانێ) ،ئیتر عوبەید بەرەو لای (یەزید) بەڕێکەوتو باسەکەی لەلای کردەوە، (زیاد)یش وەڵامی نامەکەی (معاویە)ی دایەوەو، پێی ڕاگەیاندبوو، سەبارەت بەم بابەتە خۆڕابگرێتو پەلە نەکا، (معاویە) ڕاکەی پەسند کردو، (یەزید)یش دەستبەرداری زۆربەی ئەو ڕەفتارانەی بوو کە

پێشتر ئەنجامی دەدان[١]. توێژینەوەی ئەم دەقە ئەم چەند ڕاستیەی خوارەوەمان بۆ دەردەخا:

أ- سەرچاوەی سەرهەڵدانی بیری (ویلایەتی عەهد)- بۆ یەزید- خودی (معاویە) بووە، ئەو دەیزانی هەنگاو بەرەو کارێکی دژوارو سامناك دەنێ، نەك بۆ شتێك کەس لەمەدا پێشی نەدابێتەوە، لە بەر ئەمە (زیاد)ی هەڵبژاردو ڕاوێژی پێکرد، (زیاد) ئەو کەسەیە کە (الأصمعي) دەربارەی دەڵێ: زۆرزانەکان -ی عەرەب- چوار کەسن: (معاویە) لە بیرکردنەوەدا، (عەمروی کوڕی عاص) لە ڕای دروستی دەستبەجێدا، (موغیرەی کوڕی شوعبە) لە بەرانبەر چارەکردنی کێشەو دژوارەکاندا، (زیاد) لە بەرانبەر وردو درشت‌و گەورەو بچوکەکاندا). (زیاد) ڕای خۆی بۆ (معاویە) دەربڕی‌و پێی وت کە با جارێك ئارام بگرێ، ئەویش قبوڵی کرد، لەبەر ئەمەبوو کە (معاویە) تا (زیاد) نەمرد هەنگاوی بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەسامناکە هەڵنەنا[٢]. (الطبري) دەڵێ: کاتێك (زیاد) مرد، (معاویە) نامەیەکی هێناو لەبەرانبەر خەڵکدا خوێندیەوە، ڕایگەیاند ئەگەر شتێکی بەسەرهات‌و مرد، ئەوا (یەزید) (وەلی عەهد)ی ئەوەو دەبێتە (خەلیفە)، ئیتر جگە لە پێنج کەسایەتی هەموو خەڵك ڕێکەوتن کە بەیعەتی پێ بدەن[٣].

ب- (معاویە) لە کاتی ڕاوێژکردنەکەدا تەنها بە وەرگرتنی بەڵێن لەسەر بەیعەتدانەکە وازی نەدەهێنا،بەڵکو دەیویست تا لەژیاندا ماوە خەڵك بەیعەت بە (یەزید) بدەن، ئەمەش شتێکی تازە بابەت بوو و، پێش ئەمە ڕوی نەدابوو، چونکە تادوای وەفاتی (ئەبوبەکر) ڕەزای خوای لێ بێت کەس بەیعەتی بە (عمر) ڕەزای خوای لێ بێت نەدابوو.

ج- زیاد هەستی بەترسناکی بڕیارەکە کرد، سەرەتای کار نەیەویست بەنامە بۆچونی دڵسۆزانەی خۆی بۆ بنێرێ،بەڵکو ویستی بە نێردراوێکی تایبەتدا بینێرێ کە (عبیداللە ی کوڕی کەعبی نەمیری)یەو، پێی باش بوو بەدەم پێی ڕابگەیەنێ، دیارە لەمەدا بەخاتری بڵاونەبوونەوەی هەواڵی نێو نامەکەو ڕونەدانی کارەساتێك بەهۆیەوە ئیحتیاتێکی یەجگار باشی کردووە،لەبەر ئەمە بە (عوبەید)ی وتبو: بۆیە بانگم کردوی‌و بۆ گەیاندنی ئەم نامە زارەکیە گومانم لە نێو قەدی پەڕەکان بۆ دروست بووە.

---

١ تأريخ الطبري (٦/٢٢١).
٢ نظام الحكم في الشريعة والتأريخ الاسلامي (١/١٩١).
٣ تأريخ الطبري (٦/٢٢١).

ح– معاویە لە بێزاریو ناڕەزایی خەڵك دەترسا، چونکە بەیعەتدان بە کوڕی (خەلیفە) لە حاڵێکدا خەلیفە لە ژیاندایە.. هەروا کارێکی ئاسان نیە.

خ– (زیاد) دەترسا (یەزید) لە قەد (ئوممەت)نەبێ، لەبەر ئەمە دەیگوت: (کارو باری ئەم ئیسلامەو زەمانەتکردنی ئەرکێکی گەورەیە، (یەزید) پیاوێکی تەنبەڵو بێ موبالاتەو، سەرباری ئەمەش خوی بەڕاوەوە گرتووە) هەروەها (عوبەید) یش ڕادەسپێرێ کە بە (یەزید) بڵێ: (زیاد) پێی چاکە (یەزید) واز لەو ڕەفتارانەی بێنێ کە خەڵك بەهۆیانەوە ڕقیان لێ دەبێتەوەو، بەمەش هەموو ئەو ترسەی دەڕەوەێتەوە کە پەیوەستە بە مەسەلەی ویلایەتی عەهدی ئەوەوە.

س– لە کۆتاییدا ، (زیاد) بۆ (معاویە)ی نوسی: کە بەهێواشی ئامۆژگاری (یەزید) بکاتو، لەم بڕیارەیدا پەلەنەکا، (معاویە)ش پێشنیارەکەی قبوڵ کرد[1]. (ئەحنەفی کوڕی قەیس)یش یەکێکی تربوو لەو کەسانەی (معاویە) دەربارەی ئەم بابەتە ڕاوێژی پێ کردن، گێڕدراوەتەوە: کاتێك (معاویە) (یەزید)ی کوڕی بۆ (ویلایەتی عەهد) دەستنیشان کرد، مەجلیسێکی بۆ گرتەوەو، لە نێو خێوەتێکی سوری دانا بوو، خەڵك بەڕیز دەهاتن، سەرەتا سەلامیان لە (معاویە)دەکردو، ئەمجا ڕویان لە (یەزید) دەکرد، یەکێك هاتو ئاوای کرد، پاشان بۆلای (معاویە) گەڕایەوەو پێی وت: ئەی ئەمیری ئیمانداران: چاك بزانە ئەگەر کاروباری موسڵمانان بەئەمە (واتە بە یەزید) نەسپێری (خراپ دەقەومێ)و لەدەست دەچێ، (ئەحنەفی کوڕی قەیس) یش لەوێ دانیشتبوو، (معاویە) پێی وت: ئەی (ئەبا بەحر) بۆ هیچ ناڵێی؟ وتی: دەترسم درۆ بڵێم خودا سزام بدا، دەترسم ڕاست بڵێم ئێوە سزام بدەن، (معاویە) پێی وت: دەك خودا لە بەرانبەر ئەم گوێڕاڵی کردنەتدا پاداشتی بە خێرت بداتەوە، فەرمانی کرد چەندین هەزار درهەمی پێ بدرێ، کاتێك چووە دەرەوە لەبەر دەرگا، کابرا پێی گەیشتو، وتی: ئەی (ئەبا بەحر)! ، من چاك دەزانم کە خراپترین مەخلوقی خودا لەم سەر زەویەدا ئەم کابرایەو کوڕەکەیەتی، بەڵام چ بکەین دەستیان لەم سەروەتو سامانو دەرگاو قفڵەکانی گیر بووەو، جگە لەو قسەیەی لە منت بیست، نازانین بەچ شتێکی تر لێیان بکێشینەوە، (ئەحنەف)پێی وت: وریای خۆت بە، چونکە بابای دوو ڕوو لای خودا خاتردار نیەو شایانی ڕێز لێگیران نیە.[2]

---

١ نظام الحکم في الشریعة والتأریخ الاسلامي (١/١٩٢).

٢ الشهب اللامعة في السیاسة النافعة (ص: ٤٥٨).

٢- هەڵمەتی ڕاگەیاندن:

(معاويە) ڕەزای خوای لێ بێت وردە وردە لە ڕێگەی هەڵمەتی ڕاگەیاندن‌و ناساندنەوە ڕێی بۆ بەزکردنەوەی پلەو پایەی (یەزید) خۆش دەکردو لەم کارانەشیدا سەرکەوتنی بەدەست دەهێنان، لە ڕستەی هەموو ئەو ڕێخۆشکردنانە: ئەمەبوو کە پۆستی سەرکردایەتی ئەو سوپایەی پێدا کە بەرەو غەزای (قوستەنتینیە)ی بەڕێکرد، دوای ئەوە لەم غەزایە گەڕایەوە پۆستی سەرۆکایەتی وەفدی حاجیانی ماڵی خودای‌پێدا، لە گەڵ ئەمەشدا هێشتا لەو ڕقو بێزاریە دەترسا کە خەڵك لە بەرانبەر (یەزید)دا هەیانەو، سڵی لەژمارەیەك (بەرهەڵستکار)یش دەکردەوەو دەترسا نەیەڵن کارەکەی سەربگرێ[1]. لەبەر هەموو ئەمانە بەردەوام کەرەستەی سازکردن‌و سەرگرتنی بڕیارەکەی کۆ دەکردنەوەو، ڕاوێژی بە (والی)و پیاوانی دەوڵەتەکەی دەکردو، لە پێناو سازکردنی کەشو هەوایەکی ساف بۆ (یەزید)و شکاندنی لەمپەرەکانی سەر ڕێی بەیعەت بۆ وەرگرتنی پشتی پێ دەبەستن، شایانی باسە (ڕەبیعەی کوڕی دارەمی)ی ناسراو بە (مسکین دارەمی)ی شاعیر، لەلایەن (یەزید)ەوە ئاوری لێ دەدرایەوەو یارمەتی دەدرا، ڕۆژێك لە مەجلیسی (معاويە) دا- کە خەڵکێکی زۆرو زۆربەی پیاوانی (ئومەوی) تێدا ئامادەبوون) بەم جۆرە شیعری خوێندەوە:

ألاليت شعري مايقول إبن عامر ومـروان أم مـاذا يقول سعيد

بني خلفاء الله مهـــلاً فــإنمــا يبوئهـــا الرحمن حيث يريد

إذا المنـــبر العربي خـــلاه ربهُ فـــإن أمـــير المؤمنين يزيد

(معاويە)ش وتی: ئەی (مسکین): بیر لەم وتەیەت دەکەینەوەو ئیستیخارەی بۆ ئەنجام دەدەین‌و ئەمجا ڕای خۆمانی لەسەر دەردەبڕین، لێرەدا هیچ کامێك لە پیاوانی ئومەوی نێو مەجلیسەکە بە بەڵێ‌و باشە نەبێ هیچ قسەیەکی تریان لە زار دەرنەچوو.[2]

٣-خەڵکی شام‌و پەسەندکردنی بەیعەتی یەزید: (معاويە) دەرکی بەوە دەکرد کە خەڵکی شام داکۆکی لەسەر مانەوەی پۆستی خیلافەت بۆ ئەوان دەکەن، - ئیتر شەو و شەوارە لێکیان گێڕایەوە- ،(خەڵکی شام) بەخاتری ئەوە بۆ خۆیان بە سەرتۆپی پیاوانی دەوڵەتی ئیسلامی بمێننەوەو نشتیمانەکەشیان پایتەخت‌و مەڵبەندی بڕیاردانی هەمیشەیی ئەو دەوڵەتە بێ، هێنانەدی هەموو ئەو ئاوات‌و خەونانەیان لە یەکلایی کردنەوەی (ویلایەتی

---

١ دراسة في تأريخ الخلفاء الأمويين (ص: ١٠٤).

٢ الشعر والشعراء لإ قتيبة (٤٥٥/١)، دراسة في تأريخ الخلفاء الأمويين (ص: ١٠٤).

عەهد) بۆ (یەزید)دا مسۆگەررکرد، ئەمە لەگەڵ ئەوەدا ئەوان بە پێچەوانەی دانیشتوانی (حیجاز) -کە ئاشنای بیری بە میراتگرتنی خیلافەت نەببون- لە میانەی حوکمڕانی دەوڵەتی بێزەنتی بۆ ماوەیەکی دورو درێژ بەسەر (شام)ی نشتیمانیانەوە لە گەڵ ئەم بەیرەوە ڕاهاتبوون، هەندێك لە خەڵکی (عێراق) یش بە حوکمی پێشینەی حوکمڕانی وڵاتەکەیان لەلایەن دەوڵەتی بنەماڵەیی ساسانی فارسەوە ئەم بیرەیان بەلاوە پەسند بوو، بەڵام بە تێڕوانین‌و بۆ چونێکی تایبەت، بەڕای ئەوان پۆستی خیلافەت‌و بەمیراتگرتنی شایانی (ئالوبەیت) (واتە بنەماڵەی پێغەمبەری خودا)(ﷺ) ە[1]. دوای ئەوە (یەزید) لە غەزای (قوستەنتینیە) گەڕایەوە، دانیشتوانی شام بەکۆی دەنگو بێ بونی هیچ ناڕەزایی‌و بەرهەڵستکاریەك لە نێویاندا، وەڵامی پرس‌و حەزی (معاویە) یان — کە خۆی لە بەیعەتدان بە (یەزید) دا نیشان دەدا- بەئەرێ دایەوە[2]، دوای ئەوەش لە هەڵمەتی وەرگرتنی بەیعەت بۆ یەزید لە خەڵکانی شارو وڵاتەکانی تری وەك (حیجاز)دا بەشداریەکی چالاکانەیان ئەنجامدا[3].

٤- بەیعەتدانی وەفدەکان: پاش گەیشتنی وەفدی هەرێمەکان، (معاویە) ڕەزای خوای لێ بێت کۆبونەوەیەکی بەرفراوانی لە (دیمەشق) ڕێکخست، ئەم وەفدانە زۆرێك لە پیاوانی تیرەو تایەفە عەرەبیەکانی لە خۆگرتبوو بۆ وێنە وەفدی وڵاتی (شام) ئەم جۆرە پیاوانەی تێدا بوو: زوحاکی کوڕی قەیسی فەهری، سەوری کوڕی مەعنی سەلەمی[4]، عبداللە ی کوڕی عوزاتی ئەشعەری، عبداللە ی کوڕی مەسعەدەی فەزاری، عبدالرحمن ی کوڕی عوسمانی سەقەفی، حەسانی کوڕی مالیکی بە حدەلی کەلەبی‌و[5]. هی تریش، هەروەها (عەمروی کوڕی حەزمی ئەنساری) — بەدرەنگەوە- بە نوێنەرایەتی دانیشتوانی (مەدینە) ئامادەبوو، (ئەحنەفی کوڕی قەیسی تەمیمی)یش بە نوێنەرایەتی دانیشتوانی (بەسرە) حازر بوو، ئەمجا هەرکامێك لەم سەرۆکانە وتەی خۆیان پێشکەش کردو، پێشوازیان لەم بۆچونە کردو پێیان هەڵگوت‌و، چەند بارە پاتیان کردەوە کە ئەمە لەپێناو بەرگرتن بەڕژانی خوێن‌و پاراستنی یەکریزی موسڵمانان باشترین ڕێبازە بگرێتە بەرو پەیرەوی لێ بکرێ[6]. ئیدی لەم

---

١ مسند أحمد (٢/٣٢٥)، الموسوعة الحديثية، حسن لغيره.

٢ تأريخ خليفة (ص: ٢١١)، مواقف المعارضة في خلافة يزيد بن معاوية (ص: ٨٩).

٣ تأريخ فلسطين، هاني أبو الرب (ص: ٣١٩، ٣٢٠)، البيان والتبيين (٣٩٢/١).

٤ مختصر تأريخ دمشق (٣٨٦/٣).

٥ مواقف المعارضة في خلافة يزيد (ص: ٨٩).

٦ مواقف المعارضة في خلافة يزيد (ص: ٩٠).

کۆبونەوەیەدا پرۆسەی (ویلایەتی عەهد)و وەرگرتنی بەیعەت بۆ (یەزید) بە ئەنجام گەیەنرا، بەڵام (عەمری کوڕی حەزمی ئەنصاری)-ی نوێنەری(مەدینە)- لەم کۆبونەوەدا ئامادە نەبوو، دیارە لەبەر یەکێك لەم دوو هۆکارە:

یەکەم: دانیشتوانی (مەدینە) ئەسڵەن ڕازی نەبون بەیعەت بە (یەزید) بدەن‌و، بەتوندی بەرهەڵستی ئەمەیان کردو، کەسیان لەکاتی دیاریکراودا بۆ شوێنی کۆبونەوەی وەفدەکان نەناردووە.

دووەم: (معاویە) هەواڵی ناڕازیبونی دانیشتوانی (مەدینە)ی پێ گەیشتبوو، دەشیزانی کە (عەمروی کوڕی حەزم) یەکێکە لەو بەرهەڵستکارانەو، ترسا ئەگەر ئامادەی کۆبونەوەکە بێ بەهۆی دەربڕینی ڕای پێچەوانەو نەیارانەی بارودۆخەکە بشێوێنێت‌و پرۆسەکە توشی خەتەری سەرنەکەوتن بێ، لە بەرئەمە (معاویە) نەیهێشت (عەمرو) لەم کۆبوونەوە بەرفراوانەدا ئامادەبێ، بەڵام پاشان وەڵامی دایەوەو بەتەنیا لەگەڵی کۆبۆوەو، گومانەکەی (معاویە)ش لەوەدا کە (عەمرو) ڕای پێچەوانەی دەبێ هاتەدی بەڵام ڕەخنەوناڕەزایی یەکەی بەسینگێکی فراوانەوە لێ قبوڵ کردوو سامانێکی زۆری پێدا[1]. هەموو ئەمە دوای ئەوە بوو کە ڕای کوڕی حەزم لە ڕای تەواوی ئەندامانی وەفد جیابوو.

٤- داواکردنی بەیعەت لە دانیشتوانی (مەدینە):

(معاویە) ڕەزای خوای لێ بێت بە دەستوری تەواوی هەرێمەکانی تر وەڵامی بۆ (ئەمیر)ی (مەدینە) نارد بەیعەت بۆ یەزید وەربگرێ،[2] جا (مەروانی کوڕی حەکەم)ی ئەمیری (مەدینە) هەستایە سەرپێ‌و وتارێکی ئاراستەی دانیشتوان کردو، هانیدان کە گوێڕایەڵ‌و فەرمانبەرداربن‌و، بەیعەت بە (یەزید) بدەن‌و، خۆیان لە ئاشوب‌و هەرا بپارێزن، (مەروان) وتی: ئەمە پەیڕەو کردنە لە ڕێبازە ڕاست‌وڕێکو ڕوونەکەی (أبوبکر)و، کردیە بەڵگە کەئەمە وێنەی ویلایەتی عەهدی (أبوبکر)ە بۆ (عمر)، ئەمەو (عبدالرحمن ی کوڕی أبی بکر) ڕەزای خوایان لێ بێت بەر پەرچی دایەوە[3]، کە هیچ وێکچونێك لە نێوان ئەم بەیعەتەو بەیعەتەکەی (أبوبکر)دا نیەو وتی: لە ڕاستیدا (أبوبکر) - لەگەڵ ئەوەدا- کەس‌و کارو عەشیرەتی خۆی هەبوو بەڵام لایبەلای پیاوێکی هۆزی (بەنی عەدی کوڕی کەعب) دا کردەوەو، ڕوانی کە ئەو

---

١ مجمع الزوائد (٧/٢٤٨، ٢٤٩) صحيح الاسناد.

٢ العقد الفريد (٤/٣٧٠، ٣٧٢)، مواقف المعارضة (ص: ٩٨).

٣ مواقف المعارضة (ص: ٩٩)، مجمع الزوائد (٥/٢٤١)، إسناده حسن

شایانی ئەم پۆستەیەو بەیعەتی پێدا، ئەمجا وتی: ئەم بەیعەتە زیاتر بە بەیعەتی هیرەقل‌و کیسرا دەچێ، ئیدی مشتومڕو دەمەقاڵە لەنێوان ئەوو (مەڕوان) دا ڕوویدا[١]. بەگوێرەی ڕیوایەتێك (عبدالرحمن) وتی: ئەی گەلۆی (بەنی ئومەییە)! پەیڕەوی لە یەکێك لەم سێ سوننەتانە بکەن، سوننەتی پێغەمبەری خودا، سوننەتی أبوبکر، سوننەتی عمر،.... هۆشیار بن ئێوە دەتانەوێ تەنها بیکەنە سیستەمی (قەیسەرییە)، هەر کات (قەیسەر) ێك مرد، قەیسەرزادەیەك دێتەپێشەوە[٢]، (مەڕوان) وتی: بیگرن، ئەویش خۆی بەنێو ماڵی (عائیشە)دا کردو، تاقەتیان پێ نەشکا بیگرن[٣]. جا– مەڕوان– وتی: ئەوە ئەوکەسەیە خودا ئایەتی دەرهەق ناردۆتە خوارەوە: ﴿وَٱلَّذِى قَالَ لِوَٰلِدَيۡهِ أُفّٖ لَّكُمَآ أَتَعِدَانِنِيٓ﴾[٤]. (عائیشە) (لە پشت پەردە)وە وەڵامی دایەوەو وتی: جگە لە پاکانەکردنی من خودا هیچ ئایەتێکی تری لەسەر بنەماڵەی ئێمە دانەبەزاندووە،[٥] بەر لە ئەمە (مەڕوان) لەسەر ڕاسپاردەی (معاویە) وەك ڕێخۆشکردنێك بۆ بەیعەتەکەی (یەزید) داوای لە دانیشتوانی (مەدینە) کردبوو کە بەیعەت بە خەلیفەی داهاتوو بدەن، ئەمەو (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) نامەیەکی لەسەر ئەم بابەتەو بەبێ ناوهێنانی (یەزید) بۆ (مەڕوان) ناردبوو،تێیدا هاتبوو: (من پیر بوومو دەترسم دوای من ناکۆکی لەنێو ئوممەتدا دروست ببێت، پێم باش بوو کەسێکتان بۆ دابنێم تا دوای من کاروباری دەوڵەت بەڕێوە ببات، حەزم نەکرد بەبێ وەرگرتنی پرس‌و ڕای تۆ ئەم کارە تێپەڕێنم، جا تکایە ئەم بابەتەیان بۆ بخە ڕوو، سەبارەت بە وەڵامی ئەوان ئاگادارم بکەوە)، جا (مەڕوان) پێشنیارەکەی (معاویە)ی خستەڕوو، خەڵك (ی مەدینە) وتیان: (معاویە) ڕایەکی باشی خستۆتەڕوو و پێکاویەتی، ئێمە حەز دەکەین کەسێکمان بۆ هەڵبژێرێت‌و، با لەمەدا کەمتەرخەمی نەنوێنێت.[٦] بەڵام کە لە جاری دووەمدا ناوی (یەزید) هێنرا، سەرەتا خەڵکی (مەدینە) ناڕازی بوون‌و، (عبدالرحمن ی کوڕی أبو بکر) ڕای ئەوانی خستەڕوو،[٧] وەکو دەبینین (مەڕوان) نەیتوانی ئەو ئەرکە ڕاپەڕێنێت کە لە لایەن (معاویە)وە پێی

١ مجمع الفوائد (٥/٢٤١)، إسناده حسن.

٢ البخاري رقم (٤٨٢٧).

٣ البخاري رقم (٤٨٢٧).

٤ سورة الأحقاف (١٧).

٥ البخاري رقم (٤٨٢٧).

٦ المدينة في العصر الأموي (ص: ٨٨)، نقلا عن الكامل في التأريخ.

٧ مواقف المعارضة في خلافة يزيد بن معاوية (ص: ٩٩).

سپێردرابوو، بۆیە (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) بڕیاریدا بە خودی خۆی سەردانی (حیجاز) بکاتو هەڵوێستی هاوەڵان سەبارەت بەم پرسە گرنگە بزانێت، ئەمەو لە مانگی ڕەجەبی ٥٦ی کۆچیدا نێتی (عومرە)ی هێناو بەڕێکەوت.[1]

کاتێك (عبدالرحمن ی کوڕی أبوبکرو، عبدالله ی کوڕی عمرو، عبدالله ی کوڕی زوبێر) هەواڵی بەڕێکەوتنی (معاویە)یان زانی، (مەدینە)یان بەجێ هێشتو بەرەو (مەککە) ڕۆیشتن،[2] کاتێك (معاویە) گەیشتە (مەدینە) وتارێکی داو خەڵکی هاندا بەیعەت بدەنو ڕوونی کردەوە کە (یەزید) بۆ ئەم پۆستە لە هەموو کەس شایانترە،[3] ئەمجا وتی: ئێمە بەیعەتمان پێداوەو ئێوەش پێی بدەن،[4] بڵاو ببۆوە کە وتبێتی: ئەو لە (عبدالله ی کوڕی عمر)و هاوڕاکانی دەترسێت بکوژرێن ئەگەر بێتو ناڕازی بن، مەبەستی ئەوە بوو خەڵکی (شام) خۆیان پێ ڕانەگیرێتو دەترسێ بیانکوژن، چونکە ئەوان پێیان وا نەبوو کەس زات بکاتو بەرهەڵستی بڕیارێك بکات کە لە لایەن ئەمیری ئیماندارانەوە دەرچوو بێتو زۆرینەی خەڵکیش پێی ڕازی بووبن، وترابوو کە گوایە (معاویە) وتوویەتی: وەڵڵاهی (عبدالله ی کوڕی عومەر) یان دەبێ بەیعەت بدات یان دەیکوژم، کاتێك ئەم هەواڵە بە (عبدالله ی کوڕی صەفوان)[5] گەیشت، توورە بوو، بڕیاری دا ئەگەر ئەم قسەیە ڕاست بێت دەبێ جەنگ لەبەرانبەر (معاویە) بەرپابکات، کاتێك سەبارەت بە ئەمە پرسیاری لە (معاویە) کرد، (معاویە) نکوڵی کردو وتی: من (عبدالله ی کوڕی عمر) بکوژم؟! وەڵڵاهی من ئەو ناکوژم.[6]

أ- (عبدالله ی کوڕی عمر) لە مەجلیسی (معاویە)دا (ڕەزای خوا لە هەموویان بێت):

کاتێك (معاویە) گەیشتە (مەککە)و لە بەجێگەیاندنی واجباتی (عومرە) بۆوە، بە دوای (عبدالله ی کوڕی عمر)یدا ناردو، ئەویش هات، (معاویە) پاش حەمدو سەناو شادە هێنان، وتی: دوای ئەمە: ئەی (ئیبنو عومەر)! تۆ پێشدا لای من دەتوت کە حەز ناکەی بەبێ (ئەمیر) تەنها شەوێکی تاریکیش سەر بنێیتەوە، من ئاگادارت دەکەمەوە کە ناکۆکی بخەیتە نێو موسڵمانانەوەو، هەوڵدەی نێوانیان تێك بدەی. لێرەدا (عبدالله) وەڵامی (معاویە)ی

١ البداية والنهاية (١١/٣٠٥).

٢ التأريخ الصغير للبخاري (١/١٠٣)، إسناده حسن.

٣ تأريخ خليفة (ص: ٢١٣، ٢١٤)، إسناده حسن.

٤ اأباطيل والمناكير والصحاح والمشاهير (١/٢٦٢)، حسن مشهور.

٥ التقريب (ص: ٣٠٨)، قتل عام ٧٣هـ بالكعبة مع (إبن الزبير).

٦ الطبقات.

دایەوەو ڕێبازی بەیعەتی خەلیفە ڕاشیدەکانی بۆ ڕوون کردەوەو پێی وت: کە ئەوانیش کوڕی وایان هەبوو زۆر لە (یەزید) باشتر بوون، هیچیش نەهاتوون وەکو (معاویە) بێن‌و کوڕی خۆیان بۆ ئەم پۆستە دیاری بکەن، ئەمجا بۆی ڕوون کردەوە کە ئەو نایەوێت یەکپارچەیی موسڵمانان شەق بکات، بەڵکو ئۆممەتی (محمد) (ﷺ) ڕای لەسەر چ شتێك ڕێك بێت‌و دڵی بە چ ئاو بخواتەوە، ئەویش لەگەڵ ئەوە یەك‌و ڕێکە، معاویە بەم وتەیە دڵو دەروونی فێنك بۆوەو پێی وت: ڕەحمەتی خودات لەسەر بێت.[1]

(عبدالله ی کوڕی عمر) یەکدەنگی‌و کۆڕای موسڵمانانی بە مەرج گرت تا بەیعەت بە (یەزید) بدات،[2] (معاویە) سەد هەزار درهەمی بۆ نارد، کاتێك (معاویە) بانگی کرد بەیعەت بە (یەزید) بدات، وتی: ئا ئەم (پارە) دەبینن، ئەگەر وابێ دینەکەم زۆر هەرزانە،[3] ئەو پێی وابوو دروست نیە پارە لەسەر بەیعەتدان وەربگیرێت: چونکە ئەمە دەچێتە بازنەی بەرتیلەوە، ئەگەر بەیعەتەکە هەق‌و ڕاست بێت ئەوا دروست نیە کرێ لە بەرانبەر هەقدا وەرگیرێت، گەر ناهەقیش بێت، ئەوا هەر دروست نیە لە پێناو ساماندا بەیعەت بە کەسێك بدرێت کە شیاو نیە،[4] (عبدالله ی کوڕی عمر) (ڕەزای خوای لێ بێت) لە بەرانبەر شێوازی بەمیراتگرتنی حوکمڕانی یان وەرگرتنی بەیعەت لە ڕێگەی پارە بەخشینەوە، هەڵوێستی نوانبکە (عبدالرحمن ی کوڕی أبوبکر) لە مەجلیسی (معاویە) (ڕەزای خوا لە هەموویان بێت):

هەر کە (عبدالله ی کوڕی عمر) لە مەجلیسی (معاویە) چووە دەرەوە، بانگی (عبدالرحمن ی کوڕی أبوبکری صدیق)یش کرا، (معاویە) دەستی بە قسە کردو، (عبدالرحمن)یش قسەی پێ بڕی‌و بە دەربڕینێکی توندو تیژ بەرپەرچی دایەوەو وتی: کە ئەو ڕێگری لە بەیعەتی (یەزید) دەکات‌و هەڕەشەی هەڵایسانی جەنگی لە دژی (معاویە) کردو، تکای لێکرد با حوکم بە شورا بێت،[6] ئەمجا هەستا، (معاویە) وتی: خودایە چۆنت ویست لەسەرە ئاوا لە شەڕی ئەوم بپارێزە، جا داوای لێکرد پەلە نەکات‌و نەچێت لە بەرانبەر خەڵکی (شام)دا نەیاری خۆی

---

١ تأريخ خليفة (ص: ٢١٤، ٢١٥)، بسند صحيح.

٢ الفقهاء والخلفاء، د. سلطان خالد (ص: ٥٨).

٣ الطبقات (١٨٢/٤)، بسند صحيح.

٤ موسوعة فقه (إبن عمر) القلعچي (ص: ١٥٣).

٥ الفقهاء والخلفاء (ص: ٥٩).

٦ تأريخ خليفة (ص: ٢١٣، ٢١٤)، بسند صحيح، مواقف المعارضة في خلافة يزيد بن معاوية (ص: ١٠٣).

ڕاگەیەنێت، دەنا بۆی هەیە بیکوژن، جا کە ئێوارە داهات‌و خەڵکیش سەرەیان بۆ بەیعەتدان ڕاگرت، (عبدالرحمن)یش ڕاوبۆچوونەکەی خۆی بردە نێو هەناوی خۆیەوەو ڕاینەگەیاند،[1] باشتر بوو بۆ (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) داوای لە شامیەکان کردبایە کە ڕووبەڕووی هیچ کەسێك لەو کەسانە نەبنەوە کە ڕای پێچەوانەی لە بەرانبەردا دەردەبڕن.

جـ (عبدالله ی کوڕی زوبێر) (ڕەزای خوای لێ بێت):

ئەمجا (عبدالله ی کوڕی زوبێر) بانگهێشتی (مەجلیس) کراو، معاویە تۆمەتباری کرد کە ئەو هۆی سەرەکی بەیعەت نەدانە بە (یەزید)و، (عبدالله ی کوڕی عمرو عبدالرحمن ی کوڕی أبوبکر)یش بە فیتی ئەو پێچەوانە جوڵاونەوە، (عبدالله ی کوڕی زوبێر) بەرپەرچی دایەوەو، پێی وت: ئەگەر لە ژێر کاروباری خیلافەتدا ماندوو بووە با پۆستەکە بەجێ بێڵێت‌و ئەو کاتە با (یەزید) لە جێی خۆی دابنێ، ئەمجا ئەویش بەیعەتی پێ دەدا، بەڵگەی بۆ هێنایەوە کە ئێستا دروست نیە بەیعەتی پێ بدات لە حاڵێکدا کە (معاویە) لە ژیاندایەو خەلیفەیەو، پێی وت: کە بە گوێرەی فەرموودەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) (دروست نیە لە یەك کاتدا بەیعەت بە دوو خەلیفە بدرێت).[2] ئەمجا وتی: تۆ ئەی (معاویە) هەواڵت پێدام کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: ((إذا کان في الأرض خلیفتان فاقتلوا أحدهما))[3] واتە: هەرکات لەسەر زەویدا دوو خەلیفە هەبوون یەکێکیان بکوژن.

د- حوسێنی کوڕی عەلی (ڕەزای خوای لێ بێت):

وەك دەبینین ڕیوایەتەکەی پێشدا، ناوی (حوسێنی کوڕی عەلی) لە ڕیزی ئەو کەسانەدا نەهێناوە کە (معاویە) دەبارەی بەیعەتەکەی مەڕ (یەزید) ڕاوێژی پێ کردوون، پێ دەچێت لەبەر ئەوە بووبێت کە (معاویە) بە کەین‌و بەینی نێوان خەڵکی (عێراق)و (حوسێن)ی زانیبێت‌و، زانیبێتی نامەی بۆ دەنووسن‌و بەڵێنی دەدەنێ کە دوای (معاویە) بەیعەتی (خیلافەت)ی پێ دەدەن، ئەمجا (حوسێن) لە (مەککە) بە (معاویە) گەیشت‌و گفتوگۆیەکی دوورودرێژی لەگەڵ ئەمجامدا، وەك دەردەکەوێت قسەکان سەبارەت بە کاروباری خیلافەت بوون‌و، هەر ئەمەش بوو کە (یەزید)ی پەست کردبوو، بە باوکی وت: چەند لە مێژبوو پیاوێك

---

١ تأريخ خليفة (ص: ٢١٤)، تأريخ أبي زرعة (١/٢٢٩)، بإسناد حسن.

٢ تأريخ خليفة (ص: ٢١٤)، باسناد حسن، حلية الأولياء (١/٣٣٠، ٣٣١).

٣ المعجم الكبير للطبراني (١٩/٣١٤)، مجمع الزوائد (٥/١٩٨)، قال الهيثمي ورجاله ثقات.

ڕایگرتبوویو بێنەوبەرەی لەگەڵ دەکردی و بەری نەدەدای ؟! وتی: وازی لێ بێنـە، لەوانەیـە لە کەسێکی تری داوا بکاتو ڕێی پێ نەدات و بیکوژێ.[1]

لە میانەی گفتوگۆکانی نێوان (عبدالله ی کوڕی عمرو، عبدالرحمن ی کوڕی أبوبکرو، عبدالله ی کوڕی زوبێر) لەگەڵ (معاویە)دا (خودا لـە هـەموویان ڕازی بێـت) دەردەکەوێت کـە ئەوان لەبەر دوو هۆ نەیاری بەیعەتدانن:

أ- دژایەتی کردنی ڕادەستکردنی پۆستی خیلافەت بە (یەزید)، چونکە لە لایەکەوە پەیوەندی باوکایەتی‌و کوڕایەتی لە نێوان ئەوو خەلیفەدا بەرقەرارەو لە لایەکی تریشەوە ئەم پرۆسەیە لە پەیڕەوی خەلیفە ڕاشیدەکاندا بوونی نەبووە.

ب- سەلماندنی پوچەڵی‌و دانەمەزراندنی ئەو بەیعەتەو ڕەتکردنەوەی، بە دەقی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) کە ڕێ نادات لە یەك کاتدا بەیعەت بە دوو کەس بدرێت. ئەوەی لێرەدا تێبینی دەکرێت، بەرهەڵستکاران نەهاتن ڕەخنە لە (یەزید) بگرن، هەموو ئەو سیفەتانەی بخەنەڕوو کە دواتر بە هۆیانەوە تاوانباریان دەکرد، بە تایبەتیش لەم وێستگە پڕ هەستیارەدا کە بەڵگەگەلێکی زۆر دەخوازێت بۆ بەستنەوەی نەیاری بەرانبەر،[2] لە ڕاستیدا لێرەدا هەستێکی بەهێز لەنێو خەڵکدا بە تایبەتی ڕۆڵەی کۆچەراندا هەبوو، کە چۆن (معاویە)یەك کە لە دوای (فەتح)ی (مەککە) موسڵمان بووەو ئێستاش کاروباری موسڵمانانی بە دەستەو، کەسانێکیش هەن لە پێش ئەودا موسڵمان بوونو لە ئەو شیاوترن بۆ ئەم پۆستە.[3]

بە گوێرەی دەربڕینەکەی (عبدالرحمن ی کوڕی أبو بکر)یش هەندێك خەڵك بۆیە دژایەتی پێشخستنی (یەزید)یان دەکرد نەبادا لاساکردنەوەی سیستەمی دەستاودەستکردنی دەسەڵاتی قەیسەری‌و خوسرەوی بێت.

کاتێك (معاویە) سەرنجی هەموو ئەو ڕەخنانەی دا کە لە لایەن هاوەڵزادەکانەوە خرانەڕوو، بینی کە هیچ یەکێك لەو ڕەخنانە پەیوەندیان بە لەکەدارکردنی کەسایەتی (یەزید)ەوە نیە، بەڵکو بریتین لە چەند بۆچوونێك کە پێچەوانەی بۆچوونەکانی خودی (معاویە)نو بەس‌و، ئەوان پێداگیری لەسەر ئەوە دەکەن کە ناکرێت‌و نابێت پەیوەندیە

---

١ الطبقات، الطبقة الخامسة (ص: ٣٧٥)، بإسناد حسن، نقلا عن مواقف المعارضة في خلافة يزيد بن معاوية (ص: ١٠٦).

٢ مواقف المعارضة في خلافة يزيد (ص: ١٠٤).

٣ مصنف إبن أبي شيبة (١١١/٩)، بسند صحيح.

خێزانیەكانو ئارەزووە شەخسیەكان دزە بكەنە نێو (خیلافەت)ەوە، چونكە لێرەوە بەهای خەلیفەو هەڵبژاردنی لەسەر بنەمای پەیوەندی ئەو بە خەلیفەی پێش خۆیەوە دادەمەزرێت.[1]

دوابەدوای چاوپێكەوتنو كۆبوونەوەی لەگەڵ (عبدالله ی كوڕی عمرو، عبدالرحمن ی كوڕی أبی بكرو عبدالله ی كوڕی زوبێر)، (معاویە) چووە سەر مینبەرو، سوپاسو ستایشی خوای كردو، وتی: (هەرچەندە قسەی بێ سەرو پێی خەڵك لە ئارادا بوویێتو پێیان وابوو كە (ئیبنو عومەر)و (ئیبنو ئەبی بەكر)و (ئیبنو زوبێر) بەیعەت بە (یەزید) نادەن، لە ڕاستیدا گوێڕایەڵو فەرمانبەردارییان نواندو بەیعەتیان پێدا)، خەڵكی (شام) وتیان: (نا بە خوا ئاوا ڕازی نابین، یان لەبەر چاوی خەڵكو بە ئاشكرا بەیعەت دەدەن، یان لە گەردنیان دەدەین)، (معاویە) بەسەریدا شیڕاندنو وتی: (ئای (سبحان الله) خەڵك چەند پەلەیانە خراپە لە بەرانبەر (قریش)دا ئەنجام بدەن! ، دوای ئەمڕۆ ئەم قسەیە لە كەس نەبیستم)، ئەمجا هاتە خوارەوەو، خەڵك وتیان: (ئیبنو عومەو ئیبنو ئەبی بەكرو ئیبنو زوبێر) بەیعەتیان داوە، ئەوانیش دەیانوت: نە بە خوا بەیعەتمان نەداوە، خەڵك دەیانوت: با با، بەیعەتتان داوە، ئیتر (معاویە) كاروانی بەڕێخستو خۆی گەیاندەوە (شام).[2]

بەم ڕیوایەتە (صحیح)و ڕاستو دروستە پوچەڵی ئەو ڕیوایەتانەمان بۆ دەردەكەوێت، كە (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) تاوانبار دەكات، بەوە كە: گوایە هاتووە دوو پاسەوانی لە پشت سەری هەر یەكێك لەم چوار هاوەڵە بەڕێزە (عبدالله ی كوڕی عمرو، عبدالله ی كوڕی زوبێرو، عبدالرحمن ی كوڕی ئەبی بەكرو، حوسێنی كوڕی عەلی) (ڕەزای خوا لە هەموویان بێت) داناونو بڕیاریدابوو هەر یەكێكیان بەیعەت نەدا ئامارە بە پاسەوانەكانی ژوور سەری بكاتو بیكوژێت، بەم جۆرەو لە ژێر گوشارو هەڕەشەی شمشێردا خەڵكو ئیبنو عومەرو ئیبنو زوبێرو ئیبنو ئەبی بەكر بەیعەتیان داوە، هاوكات لەگەڵ ئەمەدا زنجیرە سەنەدی ڕیوایەتەكە زەعیفو لاوازە، ئەوا بە هەمان شێوە نێوەڕۆكەكەشی پوچەڵەو بەرانبەر تیشكی دووربینی ڕەخنە خۆی ڕاناگرێت،[3] بۆ وێنە: لە سەرەتای ڕیوایەتەكەدا هاتووە: كاتێك

---

١ مقدمة في تأريخ صدر الاسلام، د. الدوري (ص: ٦٤).

٢ تأريخ خليفة، بسند حسن (ص: ٢١٤).

٣ مواقف المعارضة في خلافة يزيد بن معاوية (ص: ١٠٦)، تأريخ خليفة (ص: ٢١٥)، بە سەنەدی (جویریەی كچی أسماء) وتی: گوێم لە پیرەكانی (مەدینە) بوو ئەمەیان دەگێڕایەوە، پلەی ڕیوایەتەكە زەعیفەو پشتی پێ نابەسترێت.

(معاویە) لە (مەککە) نزیك بۆوە، بە (میرقـال)ی سـەرۆکی پاسـەوانەکانی وت: تووشـی هـەر کەسێك بوون نەیەڵی بە پێ بڕوات، من سواری وڵاخی دەکەم، (معاویە) بە تـەنیا دەڕۆیـشت، کاتێك گەیشتە نێوەڕاستی شیوی (ئەڕاك) تووشـی (حوسـێنی کـوڕی عـەلی) بـوو، ڕاوەسـتاو وتـی: مەرحـەبا لـە کـوڕی کـچی ڕەسـولی خـودا (ﷺ) سـەروەری لاوانـی بەهەشـت، داوای وڵاخێکی کردو وتی: با (أبو عبدالله) سواری بێت، کەمێکی تر ڕۆیـشت (عبـدالرحمن ی کـوڕی ابی بکر) دەرکەوت، بە ئەویشی وت: مەرحەبا لـە هـاوەڵی پێغەمبـەری خـودا (ﷺ)و کـوڕی (صدیق)و سەروەری موسڵمانان، وڵاخێکی بۆ داوا کردو، ئەویش سواری بوو، ئەمجا (عبـدالله ی کوڕی زوبێر) دەرکەوت‌و پێی وت: مەرحەبا لە کـوڕی حـەواری پێغەمبـەری خـودا (ﷺ)و کوڕی کچی (صـدیق)و کـوڕی پـورزای پێغەمبـەری خـودا (ﷺ)، داوای وڵاخێکـی بـۆ کـردو، ئەویش سواری بوو، ئیتر هەتا لە ئەرکـەکانی (عـومرە) نـەبۆوە هیـچی لـەڕوو نـەدان،[1] بـەڵام بـاقی ڕیوایەتەکـە کـە دەڵێـت: (معاویـە) دوو پاسـەوانی لـە ژوور سـەری هـەر یـەکێك لـە بەرهەڵستکارەکان ڕاگرتبوون‌و، فەرمانی پێ کردبوون هەر کامێکیان ئامادە نەبوو بەیعەت بە (یەزید) بدات بیکوژن، ئەمە لەبەر ئەم دوو هۆیە لە ڕاستیەوە دوورە:

یەکەم: ئایا شتێکی نامۆ نیە (معاویە) بەم جۆرە توندو تیژی لـە ئاقـار ڕۆڵـەی هـاوەڵان‌و خودی هاوەڵاندا بەکار بێنێـت‌و کـارێکی لـەم جـۆرە ئـەنجام بـدات کـە سـەر بـۆ فراوانبـوونی بازنەی ناکۆکی بکێشێت‌و کەلێنی نێـوان (یەزیـد) لـە لایەکـەوەو (هـاوەڵان‌و ڕۆڵـەکانیان) لـە لایەکی ترەوە گەورەتر بکات؟!

دووەم: ئایا بە بینینی دیمەنی وەستانی پاسەوانگەل بە چەکەوە لە پشت سـەری (ئیبنـو عومەرو ئیبنو ئەبی بەکرو ئیبنو زوبێرو حوسێن)ەوە خەڵك گومـانی زیاتریـان لەسـەر لاوازی جێگەو پێگەی (یەزید) بـۆ پەیـدا نـەدەبوو؟ ئایـا ئـەو کاتـە خـەڵك تێنەدەگەیـشتن کـە ئـەم پاسەوانانە نیازیان خراپەو قەناعـەتیان بـۆ دروسـت نـەدەبوو کـە بەیعەتدانەکـە بـە تـۆبزی‌و زۆرەملێیەو فرت‌و فێڵە؟ بێگومان لە حـاڵێکی ئـاوادا ئـەوانیش غـیرەت دەیگـرتن‌و ملیـان بـۆ بەیعەتدان نەدەدا.[2]

---

١ تأريخ خليفة (ص: ٢١٥)، ڕیوایەتێکی (ضعیف)و لاوازەو پشتی پێ نابەسترێ.

٢ مواقف المعارضة في خلافة يزيد (ص: ١١٠).

## سێیەم: مێژووی پاڵاوتنی (یەزیدی کوڕی معاویە) بۆ ویلایەتی عەهد:

مێژوونووسان سەبارەت بە مێژووی پاڵاوتنی (یەزیدی کوڕی معاویە) بۆ ویلایەتی عەهد قسەی جیاواز دەکەن، بەم جۆرە:

١ـ (خلیفة بن خیاط)و[1] (الذهبي)[2] دەڵێن: لە ساڵی ٥١ی کۆچیدا بووە.

٢ـ (إبن عبدربه)[3] دەڵێت: لە ساڵی ٥٥ی کۆچیدا بووە.

٣ـ (الطبري)[4]و (إبن الجوزي)[5]و (إبن الأثیر)[6]و (إبن کثیر)[7] دەڵێن: لە ساڵی ٥٦ی کۆچیدا بووە.

ئەمەو دوای خوێندنەوەیەکی قوڵی ئەم بابەتە دەردەکەوێت کە (یەزیدی کوڕی معاویە) لە ساڵی (٥١)ی کۆچیدا نەپاڵێوراوە،[8] لەبەر ئەم چەند هۆیانە:

أـ کۆچی دوایی (حەسەنی کوڕی عەلی) (ڕەزای خوای لێ بێت) لە هەمان ساڵ (واتە ٥١ك)دا بووە، (معاویە)ش بۆ دەرکردنی بڕیاری پاڵاوتنی جێگرەوەی خۆی پێویستی بە کاتو دۆخێکی وا دەبوو کە بتوانێت بە ئارامیو خاترجەمی ڕاوێژی تێدا بکات، لە هەمان کاتدا ڕاستەوخۆ ڕاگەیاندنی پاڵاوتنەکە لە دوای کۆچی دوایی کەسایەتیەکی وەکو (حەسەنی کوڕی عەلی) (ڕەزای خوای لێ بێت) بە کارێکی ژیرانە دانانرێت.

بـ کوژرانی (حجری کوڕی عەدی) (ڕەزای خوای لێ بێت) لە هەمان ساڵ (واتە ٥١ك)یدا، بە هەمان شێوە ڕاگەیاندنی پاڵاوتنی (یەزیدی کوڕی معاویە) لەو ساڵەدا بە کارێکی ژیرانە دانانرێت چونکە: دڵو دەروونەکان بە گشتی لە دۆخێکی ئاوادا بۆ وەرگرتنی بڕیارێکی ئاوا ساز نەکرابوون، بێگومان دیاریکردنی کارێکی گونجاوو دۆخێکی لە بارو ئارام بۆ تێدا ڕاگەیاندنی بڕیارێکی ئاوا هەستیارو چارەنووسساز یەکێکە لە هۆکارە کاریگەرەکانی سەرکەوتنو سەرگرتنی.

---

١ تأريخ خليفة (ص: ٢١٣).

٢ تأريخ الاسلام (عهد معاوية) (ص: ١٤٧).

٣ العقد الفريد (٣٣٨/٤).

٤ تأريخ الطبري (٢١٩/٦).

٥ المنتظم (٢٨٥/٥).

٦ الكامل في التأريخ (٥٠٨/٢).

٧ البداية والنهاية (٣٠٥/١١).

٨ مرويات خلافة معاوية في تأريخ الطبري (ص: ٤٥٠).

ج - پاڵاوتنی (یەزیدی کوڕی معاویە) بۆ ویلایەتی عەهد، لە میانەی ویلایەتی (مەڕوانی کوڕی حەکەم)دا بووە بەسەر وڵاتی (حیجاز)دا،[1] شیاوی باسە (مەڕوانی کوڕی حەکەم) لە سەردەمی معاویەدا لە دوو خولی لێك جیاوازدا حوکمی وڵاتی حیجازی کردووە، خولی یەکەم لە ساڵی ٤٢ك تا ٤٩ك درێژەی کێشاوە، خولی دووەمیش لە ساڵی ٥٤ك–٥٧ك یدا بووە، لێرەدا گومانی تێدا نامێنێت کە پرۆسەی پاڵاوتنەکەی یەزید لە خولی دووەمدا بووە.

دوای ئەمە دوو مێژوو بۆ ڕاگەیاندنی دەمێننەوە کە بریتین لە ساڵی ٥٥و ٥٦ك، کە بێگومان ئەم دوانەش وەك لەمەولا ڕوون دەبێتەوە تەواوکەری یەکترن، بەڵام لێرەدا پرسیارێك سەر هەڵدەداتو دەڵێت: وەك دەزانین (حەسەنی کوڕی عەلی) (ڕەزای خوای لێ بێت) لە ساڵی ٥١ك یدا کۆچی دوایی کردووە، باشە هۆی چ بوو (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) دوای تێپەڕینی چەند ساڵێك بەسەر ئەمەدا (واتە لە ٥٥و ٥٦ی کۆچیدا) پرۆسەی پاڵاوتنی (یەزید) بۆ ویلایەتی عەهد ڕادەگەیەنێت؟ وەڵامی ئەم پرسیارە لە گەورەترین ڕووداوی ساڵی (٥٥)ی کۆچیدا خۆی حەشارداوە، ئەویش ئەمەیە کە لەم ساڵەدا (سەعدی کوڕی أبی وقاص) (ڕەزای خوای لێ بێت) کۆچی دوایی کرد، کە دواهەمین کەس بوو لە ڕیزی ئەو شەش کەسایەتیەی (عمری کوڕی خطاب) (ڕەزای خوای لێ بێت) لێیان ڕازی بوو و بۆ پۆستی خیلافەتی دوای خۆی پاڵاوتبوون.[2]

## چوارەم: کۆچی دوایی (عبدالرحمن ی کوڕی خالیدی کوڕی وەلید):

هەندێك لە چیرۆکهەڵبەستەکان هەوڵیان داوە پەیوەندیەك لە نێوان کۆچی دوایی (عبدالرحمن ی کوڕی خالیدی کوڕی وەلید)و بەیعەتدان بە (یەزیدی کوڕی معاویە)دا پەیدا بکەن، هەندێکیان وتویانە، گوایە: کاتێك (معاویە) سرنجی داوە (عبدالرحمن) بە هۆی سیفەتگەلێکی ڕەندیەوەو هەموو ئەو ئازایەتیو دەستوەشاندنانەی لە خاکی ڕۆمدا تۆماری کردوونو ڕاوەستاوو سەربەخۆشە، جێگەو پێگەیەکی بەرزی لە لای خەڵکی شام هەیە، ئیدی (معاویە) لێی دەترسێتو فەرمان بە (ئەثال)ی پزیشکی نەصرانی دەکات چارەی بکات، ئەویش ژارخواردی کرد.[3] هاوکات لەگەڵ ئەمەدا (إبن الکلبي) هۆکاری مردنەکەی بۆ شتێکی

---

[1] صحيح البخاري مع الفتح (٨/٤٣٩).

[2] مرويات خلافة (معاوية) (ص: ٤٥٢)، سير أعلام النبلاء (١/١٢٣).

[3] تأريخ الطبري (٦/١٤٣)، ڕیوایەتێکی (زەعیفو لاوازە).

تر دەگێڕێتەوەو دەڵێت: کاتێك (معاویە) ویستی (خەلیفە)یەك بۆ دوای خۆی دابنێت، ڕووی لە مەجلیسەکەی خۆی کردو وتی: ڕاتان لەسەر کێیە؟ وتیان: (عبدالرحمن ی کوڕی خالید) دیاری بکە، –ئەو کەسێکی جوامێرو لێهاتوو بوو–، معاویە بێدەنگ بوو، ئەمەی لە دڵی خۆی گرت، ئەمجا (عبدالرحمن) نەخۆش کەوت، (معاویە) بانگی (ئەثال)ی دکتۆرە تایبەتەکەی خۆی کردو، فەرمانی پێکرد (لە جیاتی دەرمان) ژەهری دەرخوارد بدات.[1] وێڕای ئەوە ئەم ڕیوایەتانە زنجیرەی سەنەدەکانیان زەعیفو لاوازن، بە هەمان شێوە ناکۆکی زۆریش لە نێوان مەتنەکانیانو واقیعی ئەو ڕۆژگارەدا هەیە، وەکو زانراوە دانانو لابردنی کاربەڕێوەبەرەکان بە دەستی خودی (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) بووەو، بە لاشیەوە قورس نەبووە، داوا لە (عبدالرحمن) بکات واز لە پۆستی سەرکردایەتیکردنی هاوینە غەزاکانی سەر سنووری ڕۆم بێنێت، یان بە یەکجاری لایبداتو فەرامۆشی بکات، پاش ئەمە هیچ جێگەو پێگەیەکی وای نەدەما کە ببێتە مایەی مەترسی لێکردنی، ئەمەو بە فیعلی (معاویە) لەم پۆستەی دابەزاندبوو، لە جێگای ئەو (سوفیانی کوڕی عەوفی غامیدی)[2] کردبووە سەرکردەی یەکێك لە هاوینە غەزاکان،[3] ئیتر کاری لەم جۆرە هیچ قورسایی‌و ئاستەنگێکی بۆ (معاویە) دروست نەدەکردو، ئەمە لە حاڵێکدا کەسانی وای لە پۆستی ئیمارەتو ویلایەت لێ دەخستن، کە زۆر لە (عبدالرحمن) گەورەو دەستڕۆیشتووترو خاوەنی پشتو پەنای زیاتر بوون، جا ئەگەر واقیعەکە ئاوا بوو بێت، چۆنو بە چ بەهانەیەکی تر دێ دەیکوژێت؟!

(الطبري) باسی غەزای دەریایی ساڵی ٤٨ك دەکاتو دەڵێت: (عوقبەی کوڕی عامری جوهەنی) سەرکردەی مصریەکان بوو، (مونذیری کوڕی زوهێر) سەرکردەی مەدینەییەکان بوو، (خالیدی کوڕی عبدالرحمن ی کوڕی خالیدی کوڕی وەلید)یش سەرکردەی هەر هەموویان بوو.[4]

---

١ كتاب الأمثال (ص: ١٩٢)، للقاسم بن سلام، ضعيف الاسناد.

٢ تهذيب تأريخ دمشق (١٨٥/٦).

٣ أنساب الأشراف (١٠٤/٤)، مواقف المعارضة في خلافة يزيد بن معاوية (ص: ٩٢).

٤ تأريخ الطبري (١٤٧/٦).

کەواتە چۆن (معاویـە) ڕازی بـووە کوڕەکـەی لـە دوای بـاوکی ببێتـە سـەرکردەیەکی ئـاوا گەورە ئەمە لە لایەك، لە لایەکی ترەوە باشـە ئەگـەر بـاوکی لـە لایـەن (معاویـە)وە کوژرابـێ (خالید) چۆن ڕازی بووە سەرکردایەتی سوپایەك بکات کە سەر بە (معاویە) بووە؟! ئایا ئـەو کە نزیکترین کەس بووە لە باوکیەوە دەگونجێت لە ئەمە بێ ئاگا بووبێت؟![1] بێگومان ڕوونو ئاشـکرایە کـە هـەموو ئەمانـە چـەند درۆو دەلەسـەو بوختـانێکنو ویـستراوە بـە هۆیانـەوە پەیوەندیەك لە نێوان مەرگی (عبدالرحمن ی کوڕی خالیدی کوڕی وەلید)و بەیعەتەکـەی مـەڕ (یەزیـد) پەیـدا بکرێـت، ئەمانـەش (وەك لـە پێـشدا باسمـان لێـوە کـرد) لـە کـۆی ئـەو درۆو بوختانگەلـەن کـە ویـسترابوو مـەرگی (حەسـەنی کـوڕی عـەلی) پـێ بـە بەیعـەتی (یەزیـد) ببەستنەوە، هەواڵی کۆچی دوایی (عبدالرحمن ی کوڕی خالیدی وەلید) بە هۆی ژەهرەوە، لە لایەن (قاسمی کوڕی سلام)و (إبن حبیب البغدادی)یەوە هاتووەو،[2] دەڵـێن مەترسـی لێکـراوە لەسـەر پۆسـتی (ویلایـەتی عەهـد) کێبەرکـەی (یەزیـد) بکـات،[3] (الـبلاذري)و[4] (ابـو الفـرج الاصـفهاني)[5]و (أبـو هـلال العـسکري)[6] یـش ئـەم ڕیوایەتـەیان هێنـاوە، بێگومـان هـەواڵی تۆمەتبارکرانی (معاویە) بە ژارخواردکردنی (عبدالرحمن ی کـوڕی خالیـدی کـوڕی وەلیـد) لـە ڕێی سەنەدێکی ڕاستو دروستەوە نەهاتووە، بەڵکو یەکێکە لە ڕیزی هەموو ئەو هەواڵە درۆو دەلەسانەی لـە دژی ئـەم هاوەڵـە بـەڕێزە هەڵبەسـتراون.[7] (إبـن الکـثیر) سـەبارەت بـە ئەمـە دەڵێت: (إبن جریر)و کەسـانی تـریش نوسـیویانە: یـەکێك هـەبوو (إبـن أثـال)ی پـێ دەوتـرا، سەرۆکی ئەهلی زیممەی (حمص) بوو، شروبێکی دەرخوارد دا کە ژەهری تێدا بوو، بـە هـۆی ئەمەوە مرد، هەندێکیان پێیان وایە ئەمەی بە فەرمانی (معاویە) کردووە، کە ڕاست نیە.[8]

---

١ مواقف المعارضة في خلافة يزيد بن معاوية (ص: ٩٣).
٢ المنمق في أخبار قريش (ص: ٣٦٠).
٣ ئەمە ڕاست نیە: چونکە پاڵاوتنەکە لە ٥٦ی کۆچیدا واتە دوای مەرگی (حسن کوڕی علی)و (سعدی کوڕی أبی وقاص) (ڕەزای خوایان لێ بێت) بوو.
٤ أنساب الأشراف (١٠٩/٤).
٥ الأغاني (١٩٧/١٦).
٦ جمهرة الأمثال (٣٨٥/٢).
٧ مرويات خلافة معاوية في تأريخ الطبري (ص: ٣٨٤).
٨ البداية والنهاية (١٧٤/١١).

## پێنجەم: هۆیەکانی پاڵێورانی (یەزید)ی (کوڕ) لە لایەن (معاویە)ی (باوك)ەوە:

١- پاراستنی یەکێتی ئوممەت:

(معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) تەماشای (یەزید)ی کوڕی کردو بینی کە ئەو، بریتیە لەو تاکە پاڵێوراوەی کە لەمەولا لە لایەن دانیشتوانی (شام) -کە خۆیان لە بەهێزترین هۆکاری چەسپاندنی پایەکانی دەوڵەتدا دەنوێنن- پشتگیری تەواوی لێ دەکرێت، لە دوا سەفەریدا بۆ (حەج)و لە میانەی پەیوەندیکردنی بە کوڕانی گەورە هاوەڵانی نیشتەجێی (حیجاز)ەوە هۆکاری پاڵاوتنی (یەزید)ی کوڕی بۆ (ویلایەتی عەهد) دەرخست، کەواتە (ترسان لە ڕوودانی ناکۆکی‌و پەرتەوازەیی) هاندەری سەرەکی (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) بوو تا ئاوا بە خێرایی بەیعەت بۆ (یەزید) وەربگرێت،[1] دەترسا ناکۆکیەك لە دوای مەرگی سەر هەڵداو سەر بکێشێت بۆ شەڕو براکوژیەکی نوێی وا کە بەس خودای گەورە بزانێت فراوانیەکەی چەند دەبێ،[2] دەترسا ئوممەتی محمد (ﷺ) وەك ڕانەمەڕێکی بێ شوان لە دوای خۆی بەجێ بهێڵێت،[3] لەبەر ئەمە بە خاتری دانانی جێگرەوەی خۆی چالاکیەکانی خۆی دەست پێکردن، هەڵبەتە چاکتر بوو (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) ژمارەیەك مێرخاسی نێو کۆمەڵگای ئیسلامی ئەو کاتی دیاری کردبانایەو ئەرکی هەڵبژاردنی کەسێکی شیاوی بۆ خیلافەت خستبایە سەر شانی ئەوانو، بە هیچ شێوەیەك توخنی پاڵاوتنی (یەزید)ی کوڕی نەکەوتبایەوە، چونکە دیار بوو کە (یەزید) لە دوای خۆی ئەو کەسە نیە بتوانێت بەر بە ناکۆکی‌و کوشتارو خوێنڕێژی بگرێت، ئەمەو لە دوای مەرگی (معاویە) هەموو ئەم کارەساتانە ڕوویانداو خوێن ڕژا، هەموو ئەو بەڵگەو پاساوانەی (معاویە) دەیکردنە هۆی پاڵاوتنی (یەزید) نەیانتوانی تاقە مەترسیەکی نێو ڕستە مەترسیەکانی ئەو برەوێننەوە کە ئەو بە هۆی چۆڵبوونی جێگاکەی پێشبینی ڕوودانی دەکردن، بەڵکو وەکو دەردەکەوێت هەموو ئەو کارەساتانە لە سۆنگەی کەسایەتی (یەزید)و تاپۆکردنی دەسەڵات بۆ بنەماڵەو وەلانانی شورا لە هەڵبژاردنی (خەلیفە)داو ژمارەیەك هۆی ترەوە ڕوویاندا، بە هەر حاڵ (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) ئیجتیهادی کردو نەیپێکا، لە ڕاستیدا ئەو بە هۆی هەموو ئەو دانایی‌و زانایی‌و

---

١ دراسات في النظم، (ص: ٤١)، د. توفيق اليوزكي).

٢ مواقف المعارضة في خلافة يزيد بن معاوية (ص: ١٣١).

٣ تأريخ الطبري (٦/٢٢٢).

توانا سیاسیە سەركەوتووەی هەیبوو، دەیتوانی لە ماوەی ژیانی خۆیداو سەبارەت بە پۆستی خیلافەتی دوای خۆی كۆڕاو یەكدەنگیو یەكێتی موسڵمانانی مسۆگەر كردبایەو لەم بوارەدا خۆی دڵنیا كردبایە، بە جۆرێك هاتبایەو كەسێكی وای لە نێو عەشیرەتی قورەیشدا دیاری كردبایە كە خەڵك شایەدیان بۆ دابایە كە زۆر لە (یەزید)ی كوڕی باشو شیاوترەو، ئیتر پیاوە دیارەكانی (كۆمەڵگای ئیسلامی)ی (شامو عێراقو حیجاز) بە یەكدەنگ لەسەری ڕێككەوتبان.

**٣ـ هێزی دەمارگیری (هەستی تایەفەگەری):**

(معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) بە هۆی پشتگیری دانیشتوانی (شام)ەوە، چووە نێو گۆڕەپانی جەنگەوەو، دواتریش پۆستی خیلافەتی وەرگرت، شامیەكان لە هەموو كەس زیاتر گوێڕایەڵی (معاویە)یان دەكردو بنەماڵەی (بەنی ئومەییە)یان خۆش دەویست، بەڵگە بۆ ئەو خۆشەویستیو فەرمانبەرداریە: كاتێك معاویە (ڕەزای خوای لێ بێت) بڕیاری پۆستی خیلافەتی (یەزید)ی خستە بەردەم دانیشتوانی (شام)، ئەوان بە دەستەجەمعیو بەبێ دواكەوتن پێشوازییان لێكردو، بەیعەتی (ویلایەتی عەهد)یان بە (یەزید) دا.[1] بەڵگەیەكی تر لەسەر بەهێزی هەستی دەمارگیری خەڵكی شام بۆ (بەنی ئومەییە): بریتی بوو لەوە كە: (مەڕوانی كوڕی حەكەم) توانی بە هۆی پشتیوانی ئەوانەوە بەسەر كاربەڕێوەبەرەكانی (عبدالله ی كوڕی زوبێر)دا زاڵ ببێ، دوای ئەویش (عبدالملك)ی كوڕی هەر بە هۆی هێزو پشتو پەنای ئەوانەوە توانی بە تەواوەتی بەسەر ناوبراودا زاڵ ببێو لە ساڵی ٧٣ك یدا بیكوژێت، لەگەڵ ئەمەشدا نابینین كەس لە خەڵكی شام گوێڕایەڵی بۆ (عبدالله ی كوڕی زوبێر) ئەنجام دابێت، بەڵكو خەڵكی (عێراق)یش خەنجەری غەدریان لە پشتی (مصعب)ی برایان داو پاڵیان بە (عبدالملك)ەوە دا، جا كەواتە لەبەرچی ئوممەت لەسەر (عبدالله ی كوڕی زوبێر) ڕێك نەكەوت، كە لەو كاتەدا كەسێك نەبوو لە كەسایەتیو جوامێریو شكۆمەندیدا شان لە شانی بدات؟ بەڵكو بە پێچەوانەی ئەمە، دەبینین (عبدالملك ی كوڕی مەڕوان) كە بە بەراوردی تەمەن بە كوڕی (عبدالله) دەشیا، توانی جڵەوی كاروباری دەوڵەتی ئیسلام بگرێتە دەست،[2] جا كەواتە دەمارگیری خەڵكی (شام) -نەك دەمارگیری (بەنی ئومەییە)- هۆكارێكی گرنگ بوو بۆ سەندنی بەیعەت بۆ (یەزید)، چونكە نابینین خانەوادەی (ئومەوی)

---

١ مواقف المعارضة في خلافة يزيد بن معاوية (ص: ١٣١).

٢ المصدر نفسه (ص: ١٣٢).

لە میانەی هێنانی (معاویـە) (ڕەزای خـوای لێ بێـت) بـۆ سـەر پۆسـتی خیلافـەت هـیچ ڕۆڵ‌و کاریگەریەکی گەورەی لەسەر گۆڕەپانی ڕووداوەکان هەبوبێت.

(إبن خلدون) بەهانـە بـۆ (معاویە) (ڕەزای خـوای لێ بێـت) دێنێتـەوەو دەڵێـت: (معاویـە) لەبەر بەرژەوەندی یەکپارچـەیی موسـڵمانان‌و یەکخستنی ڕاوبۆچـوونی ئـەوان هـات جیـا لـە خـەڵکانی تـر (یەزیـد)ی هەڵبـژارد، چـونکە لـەو کاتـەدا (ئـەهلی حـەلو عەقـد) لـە بازنـەی کەسایەتیەکانی (بەنی ئومەییە)دا بوو، ئەوانیش -کە تاقمەیـەکی بـە جەزرەبـەو بـە شـان‌و شەوکەوت‌و دەسترۆیشتوو زاڵ بوون- جگە لە کەسێکی خۆیان بە کەسی تر قایل نەدەبوون، ئەویش بە خاتری ئەمە (یەزید)ی بەسەر هەموو ئەو کەسایەتیانەدا هەڵبژارد کە دەیزانـی بـۆ بەدەستەوەگرتنی ئەم پۆستە لە ئەو شیاوتر بوون، ئیتر هات (چـاك)ی بەسـەر (چـاکترین)دا هەڵبژاردو، لەمەدا ویستی ئامـانجێکی گـەورە بپێکێـت -کـە بـە لای خـودای شـەرعدانەرەوە دەخرێتە پێش زۆر شـتەوە- کـە بریتـی بـوو لـە یەکخستن‌و یـەکڕیزی ئوممـەت‌و یـەکگرتنی ڕاوبۆچوونەکانی، ئیدی بێ لەم گومانە هیچ گومانێکی تر بە (معاویە) (ڕەزای خـوای لێ بێـت) نابرێت، دادپەروەری‌و پلەی هاوەڵایەتیەکەی ڕێیان پـێ نـەداوە بـە خـاتری شـتێکی تـر ئـەم کـارەی ئـەنجام دابێـت، ئامـادەبوونی گـەورە هـاوەڵان‌و بـێ دەنـگ بوونیـان لـە بەرانبەریـدا بەڵگەیە بۆ ئەوە کە نابێ گومانی خراپی پێ ببرێت، چونکە هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێ بێـت) لەوانە نەبوون بەسەر ناهەقیدا بـازدەن‌و چاوپۆشـی لێ بکـەن، (معاویـە) لـەو کەسـانە نـەبوو هەقی پێ قبوڵ نەکرێت‌و خۆی بەسـەردا بسەپێنێت، بـەڵکو ئـەوان هـەموویان زۆر لـە ئەمـە گەورەتر بوون.[1]

هـەر (إبـن خلـدون) دەڵێـت: (معاویـە) لـە ترسـی پـەرتبوونی ڕاو بڕیارەکـانی ئوممـەت (یەزید)ی کردە (وەلی عەهد)، ئەمە لە کاتێکدا (بەنو ئومەییە) ڕازی نەدەبوون ئەم پۆستە بە کەسێکی دەرەوەی خزمایەتی خۆیـان بدرێت، ئەگـەر کەسـێکی تـری بـۆ (ویلایـەتی عەهـد) ڕاسپاردبایە لە بەرانبەریدا ناتەبا دەبوون.[2]

١ مقدمة إبن خلدون (١/٢٦٢، ٢٦٣).

٢ مقدمة إبن خلدون (١/٢٥٧، ٢٥٨).

واتە: هێزی دەمارگرژی‌و دەسەڵاتی ئومەویزادەکان‌و نەچوونە ژێرباری فەرمانی کەسێکی غەیری خۆیان وای لە (معاویە) کردووە کەسێك لەو خانەوادەیە هەڵبژێرێت، ئیتر لە پێناو پەرتەوازەنەبوونی ئوممەت هات (یەزید)ی کوڕی پاڵاوت.[1]

گومانی تێدا نیە ئەگەر (معاویە) بهاتبا‌و بیّ لە (یەزید)ی کوڕی پیاوێکی شیاوو لێوەشاوەی قورەیشی هێنابایەو، سەبارەت بە ئەو پرسی بە خەڵکانی خاوەن ئاوەزو ڕا کردبایەو، ئەمجا ئەوپەڕی قورسایی خۆی لە پشتگیریکردنی ڕاشکاوانەی خۆی بۆ بخستبایە گەڕو، داوای لە (ئەهلی حەلو عەقد)ی نێو ئوممەت کردبایە بەیعەتی پێ بدەن، ئایا ئەو کاتە کەس نەیار دەبوو؟ تەبعەن، نەخێر، چونکە داواکار (ئەمیری ئیمانداران)ەو، بابای پاڵێوراویش ئەو کەسەیە کە ئەو خواستی لەسەر هەڵبژاردنی هەبووەو، بەیعەتدان بە کەسێکی ئاواش بەبێ دروستبوونی سۆزو تەمومژی هیچ گومان‌و دردۆنگیەك سەری دەگرت‌و بەرژەوەندی گشتی ئوممەت‌و دەوڵەتیش دەهاتەدی، ئایا تۆش لەگەڵ من پێت وانیە کە ئەمە دەکرا بکرێت‌و خشەی لێوە نەیاو؟ مەبەستی بکەری وتەی ئەو کەسەش دەهاتەدی کە دەیوت: ئامانجی (ویلایەتی عەهد) بریتیە لە داخستنی دەروازەکانی پەرتەوازەیی‌و ئاژاوەو ناتەبایی نێو ئوممەتی ئیسلام‌و، دوورخستنەوەی موسڵمانان لە مەترسیەکانی سەرهەڵدانی ئاشوبێکی نوێ؟ بەڵام بە هەر حاڵ (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) ئیجتیهادی کرد، ئەگەر پێکابێتی دوو پاداشتی دەدرێتێ‌و، ئەگەر نەشیپێکابێ یەك پاداشتی دەستگیر دەبێت.[2]

٣ـ (معاویە)و خۆشویستن‌و قەناعەتهەبوونی لەسەر (یەزید):

(إبن کثیر) دەڵێت: کاتێك (معاویە) لەگەڵ (حسن) پێکهات، بەڵێنی دا دوای ئەو پۆستەکە بکەوێتەوە دەست (حسن) بەڵام کە (حسن) کۆچی دوایی کرد داڵغەی (یەزید)ی لێداو پێی وابوو شیاوی ئەمەیە، هەڵبەتە هەموو ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ خۆشویستنی بێ ڕادەی باوك بۆ کوڕو، دەرکەوتنی نیشانەکانی جوامێری‌و هەڵکەوتوویی دونیایی لە دەم‌و چاوو لەش‌و لاریدا، بە تایبەتی کە ڕەنگدانەوەی ئەمە لە بیچمی ڕۆڵەی پاشاو دەسەڵاتداراندا بەڵگە نەویستەو، وێڕای ئەمەش لە هونەرەکانی جەنگ‌و ڕێکخستنی کاروبارەکانی دەوڵەت‌و ڕاپەڕاندنیدا شارەزان، ئیتر گومانی برد هیچ کامێك لە ڕۆڵەکانی هاوەڵان بەم واتایە ئەرکەکانی پێ بەڕێوە

---

١ مرويات خلافة معاوية في التأريخ الطبري (ص: ٤٦٢).

٢ العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ١٢٦).

نابرێت،[١] (عەمروی کوڕی حەزمی ئەنصاری) (ڕەزای خوای لێ بێت) یەکێك لەوانەی بەرهەڵستی بەیعەتەکەی مەڕ (یەزید)ی دەکرد، خودای بە گژ (معاویە)دا کردو داوای لێکرد حیساب بۆ پاشەڕۆژی (خراپی) بڕیارەکەی بکاتو چاك وایە وازی لێ بێنێت، (معاویە) سوپاسی کردو پێی وت: تۆ مرۆڤێکی دڵسۆزی، ئەمجا ڕاشکاوانە ڕوونی کردەوە: کە تەنها کوڕی ئەوو کوڕانی هاوەڵانی بە دەستەوە ماون، کوڕی ئەویش لە کوڕەکانی ئەوان شیاوترە.[٢]

چەند سیفەتێك لە (یەزید)دا هەبوونو، هەر ئەمانەش (معاویە)یان هاندا بیکاتە (وەلی عەهد)ی خۆی، (الذهبي) لە باسی ژیانی (یەزید)دا دەڵێت: بەهێزو ئازا بوو، زرنگو چاپوكو خاوەنڕا بوو، زیرەكو زمانپاراوو ڕەوانبێژ بوو.[٣] (إبن کثیر) دەڵێت: (یەزید) چەند سیفەتێکی پەسندی تێدا هەبوون وەك: بەخشندەیی، ژیری، ڕەوانبێژی، شاعیری، ئازایەتی، ڕای بەجێ لە حوکمڕانیدا.[٤] پێ دەچێت ئەمە پاڵی بە (معاویە)وە نابێتو پێی وابووبێت ئەم سیفەتانەی بەشی ئەوەی دەکەن بۆ گرتنەدەستی جڵەوی خیلافەت گونجاو بێت.[٥]

بێشك هاوەڵانو ڕۆڵەکانیان زۆر لە (یەزید) باشو گونجاوتر بوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەوانەیە (معاویە) جۆرە توانایەکی بۆ سەرکردایەتی کردنی ئوممەت تێدا بەدی کردبێت کە لە ئەوانی دیکەیدا نەدیبێت، بە حوکمی ئەوە ماوەیەکی دوورودرێژ لەگەڵ خۆی ژیابوو ئەزمونێکی تایبەتی وەرگرتبوو، لە نزیکەوە ئاگاداری بێنەو بەرەو بگرەو بەردەی ڕووداوە سیاسیەکانی سەردەمی خۆی بوو، پشتیوانیو هەواداری دانیشتوانی شامی بۆ مسۆگەر ببوو، وێڕای ئەمەش (معاویە) یەزیدی لەسەر دادپەروەری ڕادەهێناو، دەیەویست شوێنپێی خەلیفە ڕاشیدەکان هەڵبگرێت، پرسیاری لێ دەکرد کە ئەگەر دەسەڵاتی بە دەستەوە گرت بە چ ڕێوڕەسمێك ئوممەت بەڕێوە دەبات؟ لە وەڵامیدا دەیوت: وەڵڵاهی باوکە ئەو کارانە ڕەچاو دەکەم کە (عمری کوڕی خطاب) ئەنجامی داون،[٦] بێ لەمە چەند هۆیەکی تریش هەبوون کە (معاویە)ی وادار کرد ئەم کارە بکات، هەر کات دوو کەس بۆ ئەم پۆستە دیاری کران، یەکیان

---

١ البداية والنهاية نقلا عن مرويات خلافة معاوية (ص: ٤٥٩، ٤٦٠).

٢ مجمع الفوائد (٢٤٨/٧، ٢٤٩)، رجاله ثقات، الإصابة (٩٢١/٤) رجاله ثقات.

٣ سير أعلام النبلاء (٣٧/٤).

٤ البداية والنهاية (٦٤٦/١١).

٥ أحداث وأحاديث فتنة الهرج (ص: ٢٠٤).

٦ الاشراف لإبن أبي الدنيا (ص: ١٢٨)، سنده ضعيف.

ئەمینداریکی تەمامعەیار بوو، ئەوی تریشیان بەهێزو دەسەڵات بوو، ئیتر کامەیان بۆ ئەم پۆستە بەسودتر بێتو زیانی کەمتری هەبێت، ئەوا ئەوەیان هەڵدەبژێردرێت، لە پۆستی سەربازیدا دەبێ بابای بەهێز بەسەر بابای بێهێزدا هەڵبژێردرێت، ئەگەرچی یەکەمیان گوناهبار بێتو دووەمیشیان ئەمیندار بێت،[١] پێویستە بۆ هەر پۆستێك کەسی پسپۆڕی خۆی بۆ دیاری بکرێت، پرسیار لە (ئیمام ئەحمەد) کرا: ئەگەر دوو فەرماندە بۆ سەرکردایەتی جەنگ هەبوون یەکیان بەهێزی گوناهبارو دووەمیان چاکی بێهێز بوو، چاك وایە کامەیان بکرێتە سەرکردە؟ لە وەڵامدا وتی: کابرای گوناهباری بەهێز، هێزەکەی بە قازانجی موسڵمانانەو گوناهەکانیشی بە زیانی خۆیەتی، بەڵام لاوازی پیاو چاك، چاکیەکەی بۆ خۆیەتیو، لاوازیەکەشی بە زیانی موسڵمانانە، کەواتە دەبێ بابای بەهێزی گوناهبار بکرێتە سەرکردە.[٢]

گەورەترین ئامانج لە دانانی سەرۆكو پێشەوا بریتیە لە: پاسەوانیکردنی موسڵمانان، بەرەنگاربوونەوەی دوژمنەکانیان، قۆڵبەستکردنی ستەمکارەکانیان، بە جوا ببوون لەسەر ستەملێکراوەکانیان، ئاسایی کردنی هاتوچۆی ڕێگاوبانەکانیان، پەخشکردنی سەروەتو سامانیان بەسەریاندا بەو گوێرەی شەرع واجبی کردووە، جا هەر کەسێك بتوانێت ئەم کارانەو هاوشێوەی ئەم کارانە ڕاپەڕێنێت مەبەستی پێشەوایەتی تێدا دێتەدیو، موسڵمانانیش ژیانو گوزەرانیان خۆش دەبێتو لە خۆیانو سامانیانو شەرەفو ناموسیان ئارخەیان دەبن، ئەگەر جگە لەم جۆرە کەسە، کەسێکی تر هەبێت، زانیاری زیاتری هەبێتو، بازنەی پەرستنی بەرفراوانتر بێتو بە تەقواو خۆپارێزتر بێت، بەڵام وەکو ئەو نەتوانێت ئەم کارانە ڕاپەڕێنێت، ئەوا ئەو کاتە زانستو خۆپارێزیو پەرستنەکەی بە سودی موسڵمانان تەواو نابن، هەرچەندە خوازیاری چاکسازیو بردنی کاروبارەکان بە ڕێڕەوە شەرعیەکانی خۆیاندا بێت، بەڵام ناتوانێت سودیان پێ بگەیەنێت، مادام ناتوانێت لە گۆڕەپانی کرداردا جێبەجێیان بکات.[٣] لە ڕاستیدا (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) ڕای لەسەر سەرۆکایەتی کەسی چاك بوو لەگەڵ ئەوەدا دەشیبینی کە خەڵکی چاکتر هەیە. ئەمانەی ڕابوردن بریتی بوون لە گرنگترین هۆکارگەلی هەڵبژاردنی (یەزید) لە لایەن (معاویە)ی باوکیەوە.

---

١ السياسة الشرعية لإبن تيمية (ص: ٢٢).

٢ المصدر نفسه (ص: ٢٢).

٣ العبرة مما جاء في الغزو والشهادة (ص: ٣٥)، صديق حسن خان.

## شەشەم: ئەو ڕەخنانەی لەسەر بەیعەتەكەی ( یەزید ) ئاراستەی ( معاویە ) كراون:

زۆرێك لە مێژوونووسانی كۆنو هاوچەرخ (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) بە تەواوەتی لە بەرانبەر ئەم بەیعەتەدا بە بەرپرسیار دەزانن، تۆباڵی هەموو ئەو هەڵانەش كە حوكمڕانانی سەردەمی ئەو تا ئێستا تێیان كەوتوونو تێی دەكەون دەخەنە ئەستۆی ئەو، هەیانە بەوە تاوانباتری دەكات كە لە سیستەمی شورای ئیسلام دەرچووەو دەڵێ: ئەو یەكەمین تێكشكێنەری سیستەمی ئیسلامە،[١] هەشیانە تاوانباری دەكاتو دەڵێت: ئەو جۆرە سیستەمەی چەسپاند كە پێشدا پشت بە سیاسەت دەبەستێتو بە پلەی دووەمیش (دین).[٢]

یان هەیانە بە پاشا پێشینەكانی فارسو ڕۆمی دەچوێنێت،[٣] هەروەها ئی وایان هەیە دەڵێت: (معاویە) بەم (بەیعەتە) پەیڕەویكردووە لە سیاسەتی (ئامانج پاكانە بۆ هۆكار دەكات) و، بەمەش بووەتە پێشەنگی قوتابخانەكەی (میكافیلی)،[٤] هەیانە (معاویە) بە ئەنجامدانی تاوانێكی گەورە تاوانبار دەكاتو دەڵێت ئەم تاوانەشی هەڵداوەتە سەر تاوانە كۆنەكانی تری،[٥] هەشیانە پێی وایە (معاویە) بە هۆی ئەم (بەیعەتە)وە لە (ئیجماع)و كۆڕای موسڵمانان دەرچووە،[٦] لێرەداو بۆ زانینی ڕاستو ناڕاستی ئەم تۆمەتانە چاك وایە پێناسەیەكی (شورا)و چۆنیەتی جێبەجێكردنی بكەین، (شورا): بریتیە لە پایەیەك لە پایەكانی سیستەمی جوكمڕانی (ئیسلام)و بناغەیەكی پتەوی نێو بناغەكانیەتی، بە پێی شەریعەتی ئیسلام كەس بە حوكمی هەڵبژێردرانی بۆ پۆستی خیلافەت یان حوكمڕانی نە كاڵای پیرۆزی لەبەر دەكرێت، نە دەسەڵاتی ڕەهای پێ دەبەخشرێت،[٧] بەڵكو لە بەرانبەر هەر كارێك لە نێو گەلەكەیدا جێبەجێی دەكات بەرپرسیارە، بەڵام ڕێبازی (شورا) سیستەمێكی تایبەتی بۆ دانەنراوەو، چۆنیەتی جێبەجێكرانی بۆ بارودۆخەكانو داخوازیەكانی ڕۆژگارە

---

١ إسلام بلا مذهب، مصطفى الشكعة (ص: ٥٨).

٢ نساء لهم في التأريخ الاسلامي نصيب، علي إبراهيم حسين (ص: ٥٨).

٣ عائشة والسياسة (ص: ٢٧٨)، مواقف المعارضة في خلافتو يزيد (ص: ١٤١).

٤ ملامح التيارات السياسية إبراهيم بيضون (ص: ١٤٧).

٥ الأعمال العربية الكاملة (٣٦/٦)، إبراهيم بيضون (ص: ١٤٧).

٦ زعماء الاسلام (ص: ٢١٩)، حسن إبراهيم.

٧ مواقف المعارضة (ص: ١٤٢)، النظرية الاسلامية للصعيدي (ص: ٤٦٨).

جیاجیاکان بەجێ هێڵراوە،[١] پێغەمبەری خودا (ﷺ) سەبارەت بە دەرکردنی بڕیار لەسەر شتێك کە وەحی لەسەر دانەبەزیبایە ڕاوێژی بە موسڵمانان دەکردو، ئەگەر ئەوان سەبارەت بەو بابەتە شارەزاتر بوونایە –واتە بڕیارەکە پەیوەست بە کاروباری دونیا بوایە– ئەوا بێ سێو دوو کردن ڕای ئەوانی پەسند دەکرد، بە هەمان شێواز خەلیفە ڕاشیدەکانیش پرسو ڕایان بە موسڵمانان بوو، ئێستا بە خێرایی سرنجتان بۆ چۆنیەتی بەستنی پەیمانی پێشەوایەتی (خەلیفە ڕاشیدەکان) ڕادەکێشین:

١ـ ڕێبازی بەستنی بەیعەت بۆ (أبوبکر) (ڕەزای خوای لێ بێت):

(ئەهلی حەللو عەقد) لە (سەقیفەی بەنی ساعیدە) کۆبوونەوەو لەنێو خۆیاندا بە شێوەیەکی تایبەت بەیعەتیان بە (أبوبکر)دا، ئەمجا لە ڕۆژی دووەمدا لە مزگەوت کۆبوونەوەیەکی فراوان ڕێکخراو، ئۆممەت بە گشتی بەیعەتیان پێدا،[٢] ئەوەی لە سەقیفەی بەنی ساعیدە هاتە ئاراوە کۆمەڵە ڕێسایەکی بنەڕەتی لێ کەوتەوە:

دیاریکردنی (سەرکردایەتی) تەنها لە ڕێی هەڵبژاردنەوە ئەنجام دەدرێتو بەس، (بەیعەت) یەکێکە لە بنەماکانی هەڵبژاردنو شەرعێنرانی (سەرکردایەتی)، (پۆستی خیلافەت) تەنها دەدرێت بە کەسێك کە لە ڕووی دینداریو ئیدارەوە لە هەمووان بەهێزو لێوەشاوەتر بێت، هەڵبژاردنی خەلیفە بە گوێرەی چەند هەڵسەنگاندنێکی ئیسلامی، کەسایەتی، ڕەوشتی ئەنجام دەدرێت، (خیلافەت) ناچێتە بازنەی پرەنسیپی میراتگرایەتی خێزانیو عەشیرەتگەریەوە، ورووژاندنی عەشیرەتی (قوڕەیش) لە (سەقیفەی بەنی ساعیدە) بەو پێوانە بوو کە واقیعەو پێویستە حیسابی بۆ بکرێتو، هەر شتێکی تریش هاوشێوەی ئەمە بوو، مادام دژایەتی (بنەماکانی ئیسلام)ی نەدەکرد پێویستە حیسابی بۆ بکرێت، ئەو گفتوگۆو مشتومڕەی لە (سەقیفەی بەنی ساعیدە) هاتە ئاراوە لەسەر بنەمای ئەو ئاسایشو دڵنیاییە ئەنجام درا کە باڵی بەسەر موسڵمانانی ئەو کاتدا کێشابوو، بە جۆرێك نە ئاشوب نە درۆ نە پیلان نە پەیمانشکێنی لە ئارادا نەبوو، بەڵکو تەنها شتێك هەبوو، ئەویش هەر هەموویان گەردنکەچ بوون بۆ دەقە شەرعیەکانو لە کاتی مشتومڕیاندا وەکو سەرچاوەی سەرەکی بۆ لایان دەگەڕانەوە.[٣]

---

١ مواقف المعارضة (ص: ١٤٣).

٢ الخلافة والخلفاء الراشدون (ص: ٦٦، ٦٧).

٣ دراسات في عهد النبوة للشجاع (ص: ٢٥٦).

أ ـ کۆبوونەوەکەی (سەقیفە) لە یەکەم بڕیاریدا ڕایگەیاند کە (سیستەمی حوکمڕانیو دەستوری دەوڵەت) دەبێ بە (شورا)و ڕاوێژی ئازاد بڕیاری لەسەر بدرێت، ئەمەش بە خاتری چەسپاندنی ئەو (شورا)یەی کە دەقی قورئانی پیرۆزی لەسەر هاتووە، ئیدی لەوێدا بە (ئیجماع) ئەو بنەمایەیان بە بەڵگەی دەقە قورئانیەکان کە فەرمان بە ئەنجامدانی شورا دەکەن سەلماند، واتە ئەم کۆڕا یە جەختی لەسەر یەکەم بنەمای شەرعی سیستەمی حوکمڕانی لە ئیسلامدا کردەوە کە بریتیە لە (شورای پابەندکەر)، ئەمەش بوو بە یەکەم بنەمای دەستووری کە لە دوای وەفاتی پێغەمبەری خودا (ﷺ) بە کۆڕا بڕیاری لەسەر دراو، بریتی بوو لە یەکەمین پشتیوانی تێکڕای هاوەڵان بۆ چەسپاندنی ئەو دەقانەی کە لە قورئانو سوننەتدا هاتوونو (شورا) واجب دەکەن.

ب ـ هەروەها لە کۆبوونەوەکەی (سەقیفە)دا بڕیار درا: کە دەبێ هەڵبژاردنی سەرۆکی دەوڵەتو حکومەتی ئیسلامیو دەستنیشانکردنی دەسەڵاتەکانی لە ڕێی (شورا) –واتە بەیعەتدانی ئازاد–ەوە ئەنجام بدرێت، ئەمجا لە ڕێی ئەمەوە دەتوانێ پۆستەکە بە هەموو ئەو مەرجانەوە بگرێتە دەست، کە گرێبەستی بەیعەتە ئازادەکە لە خۆی گرتوون کە ڕێك بەرانبەرە بە دەستور لە ڕژێمە هاوچەرخەکانی ئەمڕۆدا، (بەیعەتدانی ئازاد) بوو بە دووەم بنەمای نێو بنەما دەستووریەکان کە بە کۆڕا (ئیجماع) وەکو بڕیاری یەکەم بڕیاری لەسەر درا.

ج ـ کۆبوونەوەکەی سەقیفە دوو بنەمای پێشدای چەسپاندنو، (أبوبکر)ی وەکو خەلیفەی یەکەمی دەوڵەتی ئیسلامی هەڵبژارد،[1] ئەمجا تا بەیعەتی گشتی پێ نەدرا پالآوتنەکەی سەقیفە نەگەیشتە ئامانجی کۆتایی خۆی، واتە کە لە ڕۆژی دووەمو لە مزگەوتی پێغەمبەری خودا (ﷺ) جەماوەری موسڵمانان لەسەری ڕێك کەوتنو، خۆیشی وتارێکی بەناوبانگی خوێندەوەو ژمارەیەك مەرجی لەسەر خۆی دانان، ئەمجا بەیعەتی تەواوەتی پێ دراو کارەکە سەری گرت،[2] لە وتارەکەیدا هاتووە: پاش حەمدو سەناو سەڵەوات: ئەی خەڵکینە من کرامە سەرۆکی ئێوەو چاکترین کەسیشتان نیم، ئەگەر کاروباری ئێوەم بە چاکی هەڵسوڕاند پشتیوانیم لێ بکەن، ئەگەر هەڵەم کرد ڕاستم بکەنەوە، ڕاستگۆیی ئەمانەتە، درۆزنی خیانەتە، بابای بێهێزو لاوازتان بەهێزە لای من هەتا بە ویستی خودا

---

١ فقه الشورى والاستشارة، د. توفيق الشاوي (ص: ١٤٠).

٢ المصدر نفسه (ص: ١٤٢).

مافەکەی بۆ دەستێنمەوە، بابای بەهێزو بە دەسەلاتتان بێهێزو دەستەپاچە دەبێت لای من، هەتا بە ویستی خودا مافە زەوتکراوەکانی لێ دەستێنمەوە، هەر نەتەوەیەك واز لە جیهادی ڕێی خودا بێنێ ئیللا خودا زەبوونیان دەکات، بەدڕەوشتی لەنێو هەر نەتەوەیەکدا بلاوبێتەوە ئیللا خودا تووشی بەلایان دەکات، ئەوەندەی فەرمانبەرداری خودام کرد ئێوەش فەرمانبەردارم بن، هەر کاتێك سەرپێچی خوداو پێغەمبەرەکەیم کرد، منیش مافی ئەوە لە دەست دەدەم ئێوە فەرمانبەرداریم بۆ بکەن، هەستنە سەرپێ نوێژەکانتان بەرپا بکەن ڕەحمەتی خوداتان لەسەر بێت.[1] لەو ڕۆژەدا (عمر) بە (أبوبکر)ی وت:

بچۆ سەر مینبەر، ئیدی هەر خەریکی بوو تا بە ناچاری چووە سەر مینبەرو بە شێوەیەکی گشتی بەیعەتیان پێدا.[2] ئەم وتارە بەپێزو ڕەوانە لەگەڵ کورتیشیدا بە یەکێك لە سەرچاوەکانی وتاری ئیسلامی دادەنرێت، (أبوبکری صدیق) لەم وتارەیدا، بنەماکانی دادپەروەریو سۆزو بەزەیی نێوان حوکمڕانو جەماوەری سەلماندنو، داکۆکی لەسەر ئەوە کرد کە گوێڕایەڵیو فەرمانبەرداری بۆ کابرای سەرۆکو کاربەدەست پەیوەستە بە گوێڕایەڵیو فەرمانبەرداری ئەو بۆ خوداو پێغەمبەرەکەی، باسی جیهادو تێکۆشانی ڕێی خودای کرد، چونکە بۆ سەر بڵندیو شکۆداری ئوممەت گرنگە، باسی خۆپاراستنی کرد لە بەدڕەوشتی: چونکە ڕەوشتبەرزی-بە پێچەوانەی بەدڕەوشتی- کۆمەڵگا لە ڕوخانو گەندەڵ بوون دەپارێزێ.[3]

٢- ڕێبازی بەسترانی بەیعەت بۆ (عمری کوڕی خطاب):

کاتێك نەخۆشی تینی بۆ (أبوبکری صدیق) (ڕەزای خوای لێ بێت) هێنا، خەڵك لە دەورەی کۆبوونەوە، وتی: وەك دەبینن دەردێکی وام بۆ هاتووە، پێم وابێ بە هۆیەوە دەمرم، ئێستا خودا دەرهەق بەو پەیمانەی بە منتان دابوو ئازادی کردوون، بەیعەتەکەمی لەسەر هەڵوەشاندوونەوە، کاروباری ئیدارەی خۆتانی بۆ خۆتان گێڕاوەتەوە، جا بۆ کێتان پێ خۆشە بیکەن بە سەرۆکی خۆتان، خۆ ئەگەر ئێوە لە ماوەی ژیانی مندا ئەم کارە بکەن زۆر باشترە نەبادا دوای من جیاوازیو ناتەباییتان لەنێودا پەیدا بێت،[4] ئیتر (أبوبکر) (ڕەزای

---

١ البداية والنهاية (٦/٣٠٥، ٣٠٦).

٢ البخاري، الأحكام (رقم: ٧٢١٩).

٣ التأريخ الاسلامي (٩/٢٨).

٤ تأريخ الاطبري (٤/٢٣٨)، التأريخ الاسلامي (٩/٢٥٨).

خوای لێ بێت) بە خاتری سەرگرتنو سەرکەوتنی پرۆسەی هەڵبژاردنی خەلیفەی داهاتوو چەند هەنگاوێکی هەڵێنان:

أ- (أبوبکر)و ڕاوێژکردنی بە گەورە هاوەڵان:

أبوبکر (ڕەزای خوای لێ بێت) سەبارەت بەم پرسە هەستیارە ڕاوێژی بە هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێ بێت) کرد، هەر یەکێك لەوان هەوڵی دەدا شتەکە لە خۆی دوور بخاتەوەو دەیوت فڵانەکەس بە هۆی ئەم سیفەتە چاكو پاکانەوە شایستەو لێوەشاوەیە، لە کۆتاییدا بە هیچ ئەنجامێك نەگەیشتنو هەموویان -بە ناچاری- بۆ لای (أبوبکر) گەڕانەوەو وتیان: ئەی جێنشینی ڕەسولی خودا (ﷺ) ڕای تۆ ڕای هەموومانە، وتی: کەواتە جارێك مۆڵەتم بدەن تا تەماشا بکەم، داخوا کێ هەم بۆ خودای هەم بۆ دینەکەی هەم بۆ بەندەکانی خودا چاكو شیاوە، جا بانگی (عبدالرحمن کوڕی عەوف)ی کرد پێی وت: زانیاریم لەسەر (عمری کوڕی خطاب) پێ بدە، وتی: سەبارەت بە چ شتێك پرسیارم لێ دەکەی کە بۆ خۆت پێی زاناتری، (أبوبکر) وتی: ئەی ئەگەر؟! (عبدالرحمن) وتی: بە خوا ڕای ئەوم لە ڕای تۆ پێ باشترە لە بەرانبەر خەڵکدا، ئەمجا بانگی (عثمان)ی کردو پێی وت: هەواڵم لەسەر (عمری کوڕی خطاب) پێ بدە، وتی: تۆ چاکتری دەناسی، (أبوبکر) وتی: ئەی (أبا عبدالله) لەسەر ئەم شتە پرسیارت لێ دەکەم، (عثمان) وتی: بە خوا ئەوەندەی من بیناسم کردارە پەنهانەکانی لە کردارە دیارەکانی چاکترن، وێنەی ئەو لە باشیدا لەنێو ئێمەدا نیە، (أبوبکر) وتی: دەك بەر ڕەحمەتی خودا بکەوی، وەڵلاهی ئەگەر دەستبەرداری ئەویش بوومایە ئەوا بەسەر تۆمدا باز نەدەدا. ئەمجا بە دوای (ئوسەیدی کوڕی حضیر)یدا ناردو هەمان پرسیاری لەویش کرد، (ئوسەید) وتی: وەڵلاهی بە چاکترین کەسی دەزانم لە دوای تۆ، بە چاکە ڕازی دەبێو، لە بەرانبەر خراپەدا توڕە دەبێ، ئەوەی دەیشارێتەوە لەوەی باشترە کە ئاشکرای دەکات، کەسێکی لە ئەو بەهێزتر نیە ئەم پۆستە بەڕێوە بەرێت، بە هەمان شێوە ڕاوێژی بە (سەعیدی کوڕی زەید)و ژمارەیەکی تر لە هاوەڵانی کۆچەرو یاریدەدەر کرد، ڕای هەموویان لەسەر (عمری کوڕی خطاب) بەیەك دەچوو، تەنها (تەڵحەی کوڕی عبیدالله) مەترسی خۆی لە بەرانبەر توندوتیژی ئەودا خستەڕوو، بە (أبوبکر)ی وت: ئەگەر لە قیامەت پەروەردگارت سەبارەت بەوە کە (عمر)ت لەجێی خۆت کردووە بە (خەلیفە)و دەشزانی کە ڕەقو توندە چ وەڵامێکت دەبێ؟ (أبوبکر) وتی: ڕاستم بکەنەوەو بە چوارمەشقی دامنیشێنن، ئەوە بە خوا دەمترسێنن؟ یاڕەبی هەر کەسێك بە ستەم لەسەر حیسابی کاروبارتان خۆی پڕ دەکات

ڕەنجەڕۆ بێت، دەڵێم: خودایە! باشترین بەندەی تۆم لە جێی خۆم بۆ بەجێ هێشتن،[1] لەسەر بابەتی توندیو ڕەقیەکەی (عمر)یش ڕوونکردنەوەیەکی خستەڕوو، وتی: ئەوە بە خاتری ئەوەبوو کە جار هەبوو دەیبینی من نەرمی دەنوێنم –ئەویش توندی دەکرد–، ئەگەر پۆستی حوکمڕانی حەواڵە بکرێت دڵنیام واز لە زۆر لەو شتانە دێنێت کە تا ئێستا باری پێوە گرتوون.[2]

ب ـ دەقی پەیمانەکەی (أبوبکر) تا لە بەرانبەر خەڵك بخوێنرێتەوە:

بسم الله الرحمن الرحيم، ئەمە بریتیە لەو عەهدو پەیمانەی أبوبکری کوڕی قوحافە کە لە دوا وێستگەی دەرچوونی لە دونیاو نزیکبوونەوەی لە یەکەم وێستگەی چوونە نێو قیامەتەوە بە چەشنێك لەو وێستگەیەدا: کافر ئیمان دێنێتو تاوانبار دەگاتە یەقینو بە درۆدانەر دان بە حەقیقەتدا دێنێت،... من لە دوای خۆم (عمری کوڕی خطاب) دەکەمە (خەلیفە) بەسەرتانەوە، جا تکایە گوێڕایەڵو فەرمانبەرداری بن، کەمتەرخەمی ناکەمو لەم کارەمدا جگە لە دڵسۆزی نواندنو ڕەچاوکردنی گوێڕایەڵیم بۆ خوداو پێغەمبەرەکەیو دینەکەیو بەرژەوەندی بۆ خۆمو ئێوە شتێکی ترم لەبەرچاو نەگرتووە، جا ئەگەر دادپەروەری ئەنجام دا، ئەوە بریتیە لەو گومانە باشەی بە ئەوم بردووەو، ئەو زانیاریەی دەربارەی ئەوو لەسەر ئەوم هەبووە، ئەگەر بە جۆرێکی تر بێت، ئەوا هەر کەس چ بکات بەسەر خۆیدا دەشکێتەوە، (لەمەدا) خێرم ویستووەو، لە نادیار نازانم: ﴿وَسَيَعْلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَيَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ ﴾[3] واتە: ئەوانەی کە ستەمیان کردووە، لەمەولا دەزانن بۆ چ جێگایەك –کە دۆزەخە– دەگەڕێنەوە.

ج ـ گەیاندنی پەیماننامەکە بە خودی خۆی:

ئەو لە ترسی ئەوە نەبادا لە دوای مەرگی تێکەڵیو ناحاڵی بوونێك لەنێوەڕۆکی پەیمانەکەدا ڕووبدات ویستی بە فەرمانی خۆیو لە حاڵەتی بە هۆشیو گۆشی خۆیدا خەڵك لەنێوەڕۆکەکەی ئاگادار بکاتەوە ئیتر هاتە دەرەوەو لە بەرانبەر جەماوەر ڕاوەستاو پێی وتن: ئایا بەو کەسە ڕازی دەبن کە لە دوای خۆم دەیکەم بە جێنشینی خۆم بەسەرتانەوە، وەڵڵاهی من کەمتەرخەمیم نەکردووە و هەوڵو تەقالای زۆرم داوە تا گەیشتوومەتە ئەم ڕایەمو خزمی خۆم بەسەرەوە دانەناون، لە ڕاستیدا من (عمری کوڕی خطاب)م لە جێی خۆم

---

١ الكامل لإبن الأثير (٢/٧٩)، التأريخ الاسلامي، شاكر (ص: ١٠١).

٢ الكامل لإبن الأثير (٢/٧٩).

٣ الشعراء (٢٢٧).

داناوەو ڕامسپاردووە ببێتە (خەلیفە)، جا کەواتە گوێڕایەڵ‌و فەرمانبەردار بن، هەموویان وتیان: بیستمان‌و بە قسەمان کردی.[١]

د- پاڕانەوە لەبەر خودا:

دەستی بەرزکردەوەو ڕووی لە خودا ناو بەوپەڕی داماوی لەبەری پاڕایەوەو ڕازو نیازەکانی دەروونی بۆ هەڵڕشتن‌و یەکبە خۆ دەیوت: خودایە! بەبێ فەرمانی پێغەمبەرەکەت کردم بە (خەلیفە)، تەنها مەبەستم ئەوە بوو ئاشت‌و تەبا بن، ترسام ئاشوبیان لە نێودا بەرپابێت، هەموو تین‌و تاقەتی خۆم بەگەڕ خست تا گەیشتمە سەر ئەم ڕایە، جا – بەڕای خۆم– باشترین کەسیانم بۆ هەڵبژاردن کە بۆ ڕێنمایی کردنیان‌و چاك بەڕێوە بردنیان لە هەموویان پێداگیرترە، ئێستا کە فەرمانی تۆم بۆ هاتووەو –کە دەبێ بمرم‌و بەجێی بێڵم– جا جێگام لەنێویاندا پڕ بکەرەوەو ئەوان هەموویان بەندەی تۆن.[٢]

هـ - ڕاسپاردنی (عثمان) بۆ خوێندنەوەی پەیماننامەکە بۆ خەڵك:

(أبوبکر) (ڕەزای خوای لێ بێت) پەیماننامەکەی مۆر کردو بۆ زیاتر دڵنیابوون لە ڕۆیشتنی بڕیارەکە بە ڕێڕەوی خۆیداو، بەبێ لێکەوتنەوەی هیچ شوێنەوارێکی خراپ، هات (عثمان)ی کوڕی عفان) (ڕەزای خوای لێ بێت)ی ڕاسپارد تا بەر لەوە بمرێت پەیماننامەکە بەسەر خەڵکدا بخوێنێتەوەو بەیعەت بۆ (عمر) وەربگرێت، (عثمان) لە بەرانبەر خەڵکدا وتی: بەیعەت بەو کەسە دەدەن کە ناوی لەم نامەدا هاتووە؟ وتیان: بەڵێ، هەر هەموویان دانیان پێدا هێناو پێی ڕازی بوون.[٣]

و- وەسێتی (أبوبکری صدیق) بۆ (عمری کوڕی خطاب) (ڕەزای خوایان لێ بێت):

دوای ئیجتیهادو بەختکردنی هەوڵ‌و تواناکانی بۆ دیاریکردنی جێنشینێکی دانستە لە دوای خۆی‌و، بە خاتری ئەوە بەبێ لە ئەستۆدابوونی گوناهو تاوانگەلێك کە لە خەلیفەی دوای خۆیەوە دەردەچن.[٤]

(صدیق) (فاروق)ی بانگ کردو کۆمەڵێك وەسێت‌و ئامۆژگاری پێشکەش کردن، لە وەسێتەکەدا هاتووە: ئەی (عومەر) پارێز لە خودا بکە، بزانە خودا ئەنجامدانی چەند کردارێکی لە ڕۆژدا پێ سپاردووی لە شەودا قبوڵیان ناکات، ژمارەیەك کاری لە شەودا بەسەر

---

١ تأريخ الطبري (٤/٢٤٨).

٢ طبقات لإبن سعد (٣/١٩٩)، تأريخ المدينة (٢/٦٦٥-٦٦٩).

٣ طبقات لإبن سعد (٣/٢٠٠).

٤ أبوبكر الصديق، علي الطنطاوي (ص: ٢٣٧).

داداوی لـە ڕۆژدا قبوڵیـان ناكـات، هـەتا فـەڕزەكان ئـەنجام نـەدەی سـوننەتەكانت لێ قبـوڵ ناكات، تەنها ئەو كەسە تەرازووی قورسە كـە تاتـەرازووی قیامـەتی بـە شـوێنكەوتنی هـەق‌و بەگراندانانی هەق لە دونیادا قورس كردووە، هـەقی خۆیـەتی تەرازوویـەك ئیمـڕۆ هـەقی تێدا دابنرێـت، سبەینێ –لـە قیامەتـدا– قـورس بێـت، تـەنها تـەرازووی ئـەو كەسـانە سـوكە كـە تاتەرازووی قیامەتیان بە هۆی شوێنكەوتنی ناهەق لە دونیادا سوك كردووە، هـەقی خۆیـەتی تەرازوویەك سبەینێ ناهەقی هەڵدرێتە ناوی سوك بێـت، خـودای بـەرزو مـەزن باسـی خـەڵكی بەهەشـتی كـردووەو، بـە جـوانترین‌و ڕازاوەتـرین كـردار كـە ئەنجامیانـداون دەیانناسـێنێت‌و لابەلای كردەوە خراپەكانیان ناكات، جا هەر كات ئـەوانت بـەبیر هاتنـەوە بڵـێ: دەترسـم بـە كاروانی ئەوان نەگەم، خودای بەرزو مەزن باسـی خـەڵكی دۆزەخـی كـردووەو، بـە خـراپترین كـردار كـە ئـەنجامیان داون دەیانترسـێنێت‌و ئـەو كـردەوە چـاكانەش كـە ئـەنجامیان داون بەسەریاندا دەداتەوە، جا هەر كات ئەوانت بەبیر كەوتنەوە بڵێ: من هومێـدەوارم كـە لەگـەڵ ئەوانە نەبم، –ئەمەت بۆیە پێ دەڵـێم– تـا بەنـدەی خـودا بـە تـرس‌و هومێدەوار بێـت‌و، نـە تەنبەڵی ڕەچاو بكات‌و ئاواتی چوونە بەهەشت لەسەر خودا بخوازێت‌و، نـە تووشـی شـۆكیش بێت‌و بە یەكجاری لە ڕەحمەتی خودا ناهومێد بێت، جا ئەگەر تۆ وەسێتەكەی منت پاراست، بزانە هیچ شتێكی پەنهان لە مەرگ مەبغوزتر نیە، كە پشتەملی گرتی دەروەستی نایەی.[1]

تێبینی دەكەین كە (عمـر) (ڕەزای خـوای لێ بێـت) لەسـەر ڕێككـەوتنی نێوخـۆی (ئـەهلی حەل‌و عەقد)و ویستی ئـەوان پۆسـتی خیلافـەتی وەرگرتـووە، چـونكە ئـەوان (ئـەبوبكر)یـان ڕاسپاردو كردیانە بریكاری خۆیان تا (خەلیفە)ی دوای خۆی دیاری بكات، جا دوای پـرس‌و ڕا گۆڕینەوە لەگەڵ ئەوان (خەلیفە)ی هەڵبـژارد، پـاش ئەمـەش ئـەم هەڵبـژاردن‌و دیاریكردنـەی خستە بەرچاوی خەڵك‌و، جا ئەوانیش هەر هەموویان دانیان پێدا هێناو لەسـەری ڕێككـەوتن، ئەندامانی (حەل‌و عەقد) بریتی بوون لـە وەكیـل‌و نوێنـەرانی سروشـتی ئوممـەتی ئیـسلامی، كەواتە بۆمان دەركەوت كە هەڵبژاردنی (عمر) (ڕەزای خوای لێ بێت) بۆ پۆستی خیلافەت لـە ڕێی ڕاست‌و ڕێكترین شێوازی ڕاوێـژكاری (شـورەوی)یـەوە ئـەنجام دراوە.[2] ئـەو هەنگاوانـەی (أبوبكر) (ڕەزای خوای لێ بێت) بۆ هەڵبژاردنی (خەلیفە)ی دوای خۆی هـەڵینان تۆزقاڵێـك لـە ڕێبازی (شورا) دەرنەچوون، ئیدی با ئـەو شـێوازەش نەگیرابێتـە بـەر كـە پێـشدا بـۆ دانـانی

---

١ صفة الصفوة (١/٢٦٤، ٢٦٥).

٢ أبوبكر الصديق، علي الطنطاوي (ص: ٢٣٧).

خودی ئەو گیرابووەبەر.[١] بەم جۆرە بە شوراو یەکدەنگی پەیمانی (خیلافەت) بۆ (عمری کوڕی خطاب) بەستراو، مێژووش هیچ ناکۆکیەکی بۆ باس نەکردووین کە دوای ئەنجامدانی پرۆسەکە پەیدا بووبێت، لە ماوەی خیلافەتی ئەویشدا کەس نەهاتووە لەسەر پۆستی دەسەڵات بەربەرەکانێی (عمر) بکات، نەك هەر ئەمە نەبووە، بەڵکو بە (ئیجماع)و کۆڕا خیلافەتی ئەویان پەسندبووەو، لە میانەی حوکمڕانیەکەشیدا گوێڕایەڵو فەرمانبەرداری بوونو هەر هەموویان لە بەرانبەر ئەودا وەك یەك وابوون.[٢]

٣ـ شێوازی بەیعەتدان بە (عثمان) (ڕەزای خوای لێ بێت):

(خەلیفە فاروق) (ڕەزای خوای لێ بێت) لە دوا ساتەکانی ژیانیداو لە کاتێکدا کە لەسەر ڕایەخی مەرگ بوو، وێڕای ئازاری زۆری برینە سەختەکانی توانی بۆ هەڵبژاردنی (خەلیفە) شێوازێکی نوێی وا داهێنێت کە پێشدا لە ئارادانەبوو، بێگومان ئەمە بەڵگەیەکی بەرهەستو نیشانەیەکی ڕۆشنە بۆ ئەو شارەزاییو فیقهەی ئەو کە لەسەر سیاسەتی دەوڵەتی ئیسلامی هەیبووە، بەر لە ئەو (پێغەمبەر) (ﷺ) ڕابوردو بە دەقی ڕاشکاو کەسی لە جێی خۆی دانەنا، (أبوبکری صدیق)یش ڕابوردو دوای ڕاوێژکردنی بە گەورە هاوەڵان (عمری فاروق)ی لە جێی خۆی دانا، کاتێك (عمر) لەسەر ڕایەخی مەرگ بوو و لە گیانەڵادا بوو، داوای لێکرا کەسێك لە جێگەی خۆی دانێ، بیرێکی قوڵی کردەوەو، بڕیاری دا، ڕێبازێکی وا بگرێتەبەر کە لەگەڵ بارودۆخەکەدا بگونجێت، پێغەمبەری خودا (ﷺ) ڕابوردو، هەموو خەڵك دانیان بەو ڕاستیەدا دێنا کە (أبوبکر) لە هەموویان گەورەو پێشڕەوترەو دروستبوونی ناکۆکیش شتێکی چاوەڕواننەکراو بوو، بە تایبەتی کە (پێغەمبەر) (ﷺ) بە گوفتارو بە کردار ڕووی لە ئوممەت کردبوو کە لە دوای خۆی (أبوبکر) بۆ بەڕێوەبردنی کاروبار لە هەموو کەس لە پێشترە، (صدیق)یش کە (عمر)ی پاڵاوت دەیزانی کە هاوەڵان –هەر هەموویان– لە دڵەوە دەزانن کە (عمر) بۆ هەڵگرتنی ئەم باری بەرپرسیاریەتیە لە هەر هەموویان بەهێزو تواناو شیاوترە، بۆیە یەکسەر دوای ڕاوێژ بە گەورە هاوەڵان لە جێی خۆی داناو، کەس نەبوو ڕای پێچەوانەی هەبێتو، ئیتر بە کۆڕا بەیعەت بۆ (عمر) بەسترا.[٣]

---

١ دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة (ص: ٢٧٣).

٢ النظرية السياسية الاسلامية، ضياء الريس (ص: ١٨١).

٣ أوليات الفاروق (ص: ١٢٢).

بەڵام ڕێبازە نوێکەی (عمر) بۆ هەڵبژاردنی (خەلیفە) پشتی بە (شورا)یەك بەست کە لە ژمارەیەکی دیاریکراوی پێکهێنا، شەش کەسی لە ڕیزی هاوەڵانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) هەڵبژاردن کە هەموویان بەدری بوونو کاتێکیش پێغەمبەری خودا (ﷺ) کۆچی دوایی کرد لێیان ڕازی بوو، هەر یەکێك لە ئەوان – بە هەبوونی جیاوازیەکی کەم لە پایەیاندا– بۆ وەرگرتنی پۆستی خیلافەت شیاو بوو، ڕێبازی هەڵبژاردنەکەو کاتو ژمارەی دەنگەکانی بۆ دیاری کردن، لە پێناو باش بەڕێوەچوونی هەڵبژاردنی نێو مەجلیسەکەو ڕێگرتن لە پشێوی تاقمەیەك لە سەربازانی خودای ڕاسپارد ئەرکی چاودێریو پاسەوانی جێبەجێ بکات، بە جۆرێك نابێ ڕێگا بە کەس بدات بچێتە ژوورەوە، یان گوێ هەڵخاو بزانێ چ لە نێو مەجلیسی ئەهلی حەلو عەقد دەگوزەرێت.[1] (ئەمیری ئیمانداران) بەم کارەی سیستەمێکی وا گونجاوی بۆ شورا دارِشت کە کەس پێش ئەو نەیکردبوو، هیچ گومانی تێدا نیە کە ئەسڵی شورا لە (قورئانو سوننەتی گوفتاریو کرداری)یدا بڕیاری لەسەر دراوەو، پێغەمبەری خودا (ﷺ)و (أبوبکر) کاریان پێ کردبوو، بە نیسبەت ئەسڵەکەیەوە (عمر) هیچ داهێنانێکی ئەنجام نەدا، بەڵام ئەوەی (عمر) کردی بریتی بوو لەو ڕێبازو شێوازەی (خەلیفە)ی پێ هەڵدەبژێدرێت، (کورت هەڵێنانی (شورا) لە ژمارەیەکی دیاریکراوی نێو خۆیان)، کە نە پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەنجامی دابوو و، نە (أبوبکر) کردبووی، بەڵکو (عمر) کردیو، باشترین شتیش بوو کە کردی، چونکە باشترین شێواز بوو کە لەگەڵ بارودۆخی هاوەڵانی ئەو کاتە بێتەوە.[2]

بەم چەشنە (ئەمیری ئیمانداران) (لیژنەیەکی باڵای سیاسی)ی دروستکرد کە هەر هەموویان لە (ئەهلی شورا) بوونو، هەڵبژاردنی خەلیفەی بە تەنها پەیوەست کرد بە ئەوانەوە، ئەوەی گرنگ بێ ئاماژەی بۆ بکەین ئەوەیە کە هیچ کامێك لە ئەندامانی ئەهلی شورا بەرهەڵستی ئەم بڕیارەیان نەکرد کە لە لایەن (عمر)ەوە دەرکراو، بە هەمان شێوە هیچ کەسێکیش لە هاوەڵان ڕەخنەی نەگرت، هەموو ئەو دەقە مێژوویانەی لەبەر دەستمان دان دەبنە بەڵگە بۆ ڕاستی ئەمە، جا ئێمە نازانین: کە هیچ پێشنیارێك لە لایەن هیچ کەسێکی ترەوە سەبارەت بەم بابەتە خرابێتەڕوو، یان ناڕەزاییو بەرهەڵستکاریەك لە دژی ئەم بڕیارەی (عمر) چ لە حاڵی حەیاتیداو چ دوای مردنی سەری هەڵدابێت، بە تەنها هەر ئەوەیە کە هەر هەموو خەڵك بەم ڕاو تەکبیرو ڕێو شوێنە قایل بوونو، پێیان وابوو بەرژەوەندی

---

[1] أوليات الفاروق (ص: ١٢٢).

[2] المصدر نفسه (ص: ١٢٧).

گشتی موسڵمانانی لەخۆ گرتووە، دەتوانین بڵێین: (عمر) دامەزراوەیەکی سیاسی باڵای پێکهێنا، کە ئەرکی ئەو بریتی بوو لە: هەڵبژاردنی سەرۆکی دەوڵەت یان (خەلیفە)، ئا ئەم ڕێکخستنە دەستوریە نوێیەی کە مێشکە بە هۆشەکەی (عمر) دایهێنا، لەگەڵ هیچ کامێك لەو هێڵە گشتیو بنەما دەستووریانە تێك ناگیرێت کە (ئیسلام) بڕیاری لەسەر داون، بە تایبەتی ئەوانەیان کە پەیوەندیان بە مەبدەئی (شورا)وە هەیە، چونکە حیساب لەسەر ئەو ئەنجامە دەکرا کە لە مزگەوتی (جامیع)ی پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەردەچوو لەسەر ئەم بنەمایە ئەو پرسیارە بەلاوە دەنرێت کە بەسەر زەینی هەندێك کەسدا دێتو دەڵێت: کێ ئەم مافەی بە (عمر)دا؟ (عمر) لەم ڕاو بڕیارەیدا بەڵگەی چ بوو؟ ئەوەندە بەسە کە بزانین دەستەیەك-ی چاكو پاك- لە موسڵمانان بەڵێیان بۆ ئەم ڕایە کردووەو پێی ڕازی بوونو، هیچ دەنگێکی نارەزاییش لە دژی نەبیستراوە، ئەمە بۆ ئەوەیە کە تا دڵنیا بین: لەوە کە (ئیجماع) -کە یەکێکە لە سەرچاوەکانی یاسادانان- لەسەر ڕاستو دروستی ئەم ڕایەو جێبەجێکردنی بەستراوە.[1] نابێت لەبیرمان بچێت کە (عمر) خەلیفەیەکی (ڕاشید) واتە سەرڕاستو بەرچاو ڕوون بوو، پێویستە جەخت لەسەر ئەوەش بکەینەوە کە: (ئەهلی شورا) بریتیە لە باڵاترین دامەزراوەی سیاسی کە (سیستەمی حوکمڕانی ئیسلامی) سەردەمی (ڕاشیدی) بڕیاری لەسەر پێکهاتنی داوە، بە هەمان جۆر ئەندامانی ئەو دامەزراوەش کە (عمر) ناوی هێنان، ئیمتیازاتێکی وایان هەبوو کە جگە لە ئەوان کەسانێکی تر لە نێو موسڵماناندا پێیان نەدرابوو، بێگومان ئەم ئیمتیازاتانەی لە لایەن خوداوە پێیان بەخشرابوو، پێغەمبەر ڕایگەیاندبوونو، بە لای ئیماندارانیشەوە ناگونجێت کەس لە موسڵمانان بگاتە پلەو پایەی ئەم دە کەسە، چ لە تەقوادا چ لە ئەمانەتدا.[2]

یەکێك لەو کارە گرنگانە ئەمە بوو کە: (عمر) سووربوو لەسەر دوورخستنەوەی پۆستی دەسەڵات لە خزمەکانی، ئەمە لەگەڵ ئەمەدا کە کەسانی شیاوو شایستەشیان تێدا بوون، دەبینین (سەعیدی کوڕی زەید)ی خزمی لە لیستەی پاڵێوراوان لادەبا،[3] وەسێت بۆ (عبدالله ی کوڕی عمر) دەکات ئامادەی دانیشتنەکەی (ئەهلی شورا) بێت، بەو مەرجە کە نابێت هیچ شتێکی بە دەست بێت بەڵام پێی وتن: ئەگەر سێ کەستان ڕای لەسەر کەسێك بوو،

---

١ نظام الحكم في الشريعة والتأريخ الاسلامي (١/٢٢٧، ٢٢٨).

٢ المصدر نفسه (١/٢٢٩).

٣ الخلفاء الراشدون للخالدي (ص: ٩٨).

سێیەکەی تریش لەسەر کەسێکی تر بوو، لەم کاتەدا (عبدالله) بکەنە حەکەم، ئەو حوکمی بۆ کام لایەدا، ئەوا کێشەکە دەبڕێتەوە، ئەگەر بە حوکمی (عبدالله)ش ڕازی نەبوون، با ڕای ئەو لایە سەرکەوێت کە (عبدالرحمن ی کوڕی عەوف)ی تێدایەو ،باسی (عبدالرحمن)ی کرد کە پیاوێکی ژیرو سەرڕاستەو خودا ئاگاداریەتی‌و گوێڕایەڵی بۆ بکەن.[1] ئەمەو (عبدالرحمن ی کوڕی عەوف) سەرپەرشتی پرۆسەی هەڵبژاردنەکەی دەکرد، لە (مەدینە)دا بەنێو خەڵکدا دەگەڕاو سەبارەت بە (عەلی)و (عثمان) (ڕەزای خوایان لێ بێت)پرسی پێ دەکردن، دەگەیشت بە هەر کەسێك لە: گەورە هاوەڵانو، پیاو ماقوڵانو، سەرکردەی سریە سەربازیەکانو، هەر کەسێکیش بهاتبایەتە (مەدینە)وە، پرسی پێ دەکردن، کار بەوە گەیشت ڕاوێژپێکردنەکەی ئافرەتانیشی بە شێوەیەکی گشتی گرتەوەو، لە پشت پەردەی حیجابەوە ڕای خۆیان دەردەبڕی، هەروەها ڕای منداڵو کۆیلەکانی شاری (مەدینە)شی وەرگرت، ئەنجامی ڕاوێژکردنەکەی (عبدالرحمن) بەم جۆرە دەرچوو: زۆرینەی موسڵمانان ڕایان لەسەر (عثمانی کوڕی عفان)ە، ئەمجا (علی کوڕی ابی طالب) (ڕەزای خوای لێ بێت)،... پاش بەرپاکردنی نوێژی بەیانی دوارۆژی مانگی قوربانی ساڵی ٢٣ك، عبدالرحمن ئەنجامگیریەکەی ئاشکرا کرد، دوای سوپاس‌و ستایش‌و شادەهێنان وتی: دوای ئەمە ئەی (عەلی)! من ڕاوێژم بە خەڵك کردو کەس بە (عثمان) بەرانبەر ناکەن، کەواتە هیچ ڕێیەکی تر مەگرە بەر. ئەمجا بە مەرجی پەیڕەوکردن لە سوننەتی پێغەمبەری خودا (ﷺ)و ڕێو شوێنی دوو خەلیفەی دوای ئەو بەیعەتی بە (عثمان) داو، یەکسەر خەڵکیش لە (کۆچەرانو یاریدەدەرانو فەرماندەی سریە سەربازیەکانو تەواوی موسڵمانان–ی مەدینە–) بەیعەتیان پێدا،[2] بە گوێرەی گێڕانەوەی خاوەنی (التمهید والبیان): (علی کوڕی ابی طالب) یەکەم کەس بوو کە بەیعەتی بە (عبدالرحمن ی کوڕی عەوف) دا،[3] (الذهبي) پێی وایە ئەم کارەی (عبدالرحمن) بریتیە لەو کارە هەرە شکۆدارانەی ئەو ئەنجامی داونو، دەڵێ: باشترین کار کە (عبدالرحمن) لە کاتی ئەنجامدانی پرۆسەی (شورا)و پرس‌و ڕا وەرگرتنەکەداو سەرپشککردنی ئوممەت بۆ دەستنیشانکرنی کەسێك لەنێو ئەو کەسانەدا کە (ئەهلی حەلوعەقد) پاڵاوتوونیو، بە خاتری چاکبەڕێوەبردنو بە ئەنجامگەیاندنی پرۆسەکە گەرمو

١ تأريخ الطبري (٥/٢٢٥).
٢ البخاري، ك: الأحكام، (رقم: ٧٢٠٧).
٣ التمهيد والبيان (ص: ٢٦).

گوڕانە ڕاپەڕی‌و کارێکی وای کرد خەڵکی لەسەر (عثمان) کۆکردەوە، خۆ ئەگەر چاوی تێوەبووایە، بۆ خۆی داوا دەکردو لە ئەنجامدا وەری دەگرت، یان دەیدا بە (سعدی کوڕی أبی وەقاص)ی ئامۆزای -کە لە هەموو پاڵێوراوەکانی لێوە نزیکتر بوو-.[1] بەم چەشنە شێوەیەکی تر لە شێوەکانی (شورا)، لە سەردەمی یەکێك لە خەلیفە ڕاشیدەکاندا بە ئەنجام گەیشت کە بریتی بوو لە: پرۆسەی جێنشینکردن‌و دامەزراندنی کەسێك بۆ ئەم (پۆستە) لە ڕێگەی مەجلیسی شوراوە دوای وەرگرتنی ڕای گشتی لەسەری‌و ئەمجا وەرگرتنی بەیعەتی گشتی بۆی.[2]

٤ـ ڕێبازی بەستنی بەیعەت بۆ (علی کوڕی ابی طالب) (ڕەزای خوای لێ بێت):

بەیعەتدان بە (علی) (ڕەزای خوای لێ بێت) بە شێوازی ئیختیاری بەڕێوە چوو، هەڵبەتە دوای شەهیدکرانی خەلیفەی ڕاشید (عثمانی کوڕی عفان) (ڕەزای خوای لێ بێت) لە لایەن خەڵکانێکی ئاژاوەگێڕی لە دین دەرچوو کە لەم سەرەو سەری جیهانی ئیسلام‌و وڵاتە دوورەکانەوە بەسەر (مەدینە)یاندا دابوو، لە خەڵکانی چەندین تیرەی جیاجیا پێکهاتبوون، جا دوای ئەوە لە ڕۆژی هەینی ١٨/ قوربانی/ ٣٥کۆچیداو بە شێوازی زۆردارانەو دوژمنکارانە کوشتیان.[3]

هەر هەموو ئەو هاوەڵانەی لە شاری (مەدینە)دا مابوونەوە، هەستان بەیعەتی پۆستی خیلافەتیان بە (علی) (ڕەزای خوای لێ بێت) دا، هەڵبەتە لەبەر ئەوە لەو دەمەدا کەس بە قەد ئەو گەورەو پایەدار نەبوو، کەسێکیش دوای (عثمان) نەهات داوای پۆستی پێشەوایەتی بۆ خۆی بکات، (أبو السبطین) واتە (علی) (ڕەزای خوای لێ بێت) لەسەر وەرگرتنی سور نەبوو، بەڵکو دوای تۆبزیکردنێکی زۆر لە لایەن ئەو هاوەڵانەی لە (مەدینە)دا مابوونەوەو لەبەر چەند هۆکارێکی وەك ترسان لە تەشەنەکردنی ئاشوبو ئاژاوە ئەم پۆستەی وەکو ئەرکێك خستە سەرشانی خۆی، لەگەڵ ئەمەشدا لە بەرانبەر ڕەخنەو گازاندەی خەڵکانێکی نەفام بە ساغی بۆی دەرنەچوو دوژمنان‌و داخ لە دڵانی (ئیسلام)ی وەك (عبدالله ی کوڕی سەبەء) هاتن‌و ئاگری ئاشوبیان هەڵکرد، شوێنکەوتووە ئالقە لە گوێ‌و مێشك پوچ‌و کەودەنەکانی -کە بە هۆی ڕەشی دڵ‌و دەروون‌و کردەوە قێزەونەکانیانەوە- گەندەڵ

---

١ سیر أعلام النبلاء (٨٦/١).
٢ دراسة في عهد النبوة والخلافة الراشدة (ص: ٢٧٨).
٣ الطبقات لإبن سعد (٣١/٣).

ببوون‌و لە هەق لایاندابوو، هاتنە نێو دۆخەکەوەو بوونە هۆکاری ڕوودانی هەردووك جەنگی (جەمەل)و (صەفین) لە نێوان هاوەڵاندا، ژمارەیەك لە زانایان باسیان لە چۆنایەتی ئەو شێوازەیان کردووە کە (علی) (ڕەزای خوای لێ بێت)ی بۆ پۆستی خیلافەت پێ هەڵبژێردراوە،[1] (أبوبکر الخلال) بە سەنەدی خۆی لە (محمدی حەنەفییە)وە دەگێڕێتەوە، کە وتوویەتی: (عثمان) گەمارۆ درابوو، منیش لە لای (علی) (رحمە الله) بووم، پیاوێك هاتە لای‌و وتی: هەر ئێستا ئەمیری ئیمانداران کوژرا، (علی) وتی: ڕەحمەتی خوای لێ بێت، (محمد) وتی: عەلی هەستاو منیش لە ترسی ئەوە نەبادا زەبرێکی لێ بدرێت باوەشم بە قەدیدا کرد، وتی: لێمگەڕێ هەی بێ دایك، وتی: ڕاستە ئەو پیاوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) کوژراوە، جا (علی) هاتەوە ماڵی خۆی‌و دەرگای لەسەر خۆی داخست، خەڵك هاتن بۆ لای‌و، لە دەرگایان داو، هاتنە ژوورەوەو وتیان: ئەو پیاوە کوژرا، پێویستە خەڵکیش (خەلیفە)یەکی هەبێت، نازانین کەس لە تۆ شیاوتر بێت، (علی) پێی وتن: داوای ئەمە لە من مەکەن، چاکترە (وەزیر)تان بم نەك (ئەمیر)، وتیان: نە بە خوا کەس ناناسین لە تۆ لێوەشاوەو شایانتر بێت، وتی: ئەگەر هەر وازم لێ ناهێنن، ئەوا نابێت بەیعەت وەرگرتنەکە بە نهێنی بێت، بەڵکو دەچم بۆ مزگەوت، ئیتر لەوێ خەڵك بەیعەتیان پێدا.[2]

٥- شێوازی بەستنی بەیعەت بۆ (حسن‌ی کوڕی علی) (ڕەزای خوایان لێ بێت):

لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٤٠ کۆچیداو، دوابەدوای شەهیدکرانی ئەمیری ئیمانداران (علی کوڕی أبي طالب) (ڕەزای خوای لێ بێت) ڕاستەوخۆ بەیعەت بە (حسن) درا، هەرچەندە ئەمیری ئیمانداران کەسی بۆ دوای خۆی دیاری نەکردبوو، بەڵام خەڵك لە دوای ئەو (حسن)یان هەڵبژارد، (عبدالله ی کوڕی سبع) دەڵێ: گوێم لە (علی) بوو -لەبەر خۆیەوە- دەیوت: بە خوا ئا ئەم -ڕیش-ە بە ئەم -خوێنی سەر-ە ڕەنگ دەکرێت، ئەوە ئەو بەدبەختە چاوەڕێی چم لێ دەکات؟ وتیان: ئەی ئەمیری ئیمانداران، هەواڵمان پێ بدە کێیە؟ تا بە خۆی‌و عەشیرەتەکەیەوە لەنێوی بەرین![3] وتی: کەواتە ئەگەر وابێ بە خوا بێ لە بکوژەکەم دەچن خەڵکانێکی تر دەکوژنەوە، وتیان: کەواتە (خەلیفە)یەك لەجێی خۆت دابنێ، وتی: نا، بەڵکو پێغەمبەری خودا (ﷺ) بۆ چ شتێکی بەجێ هێشتن، منیش بەم

---

١ عقيدة أهل السنة في الصحابة الكرام (٦٧٧/٢).

٢ كتاب السنة لأبي بكر الخلال (ص: ٤١٥).

٣ مجمع الزوائد (٩٢١/٩)، مسند أحمد (٣٢٥/٢)، حسن لغيره.

شێوەیە بەجێتان دەهێڵم، وتیان: ئەگەر بە خزمەتی پەروەردگارت گەیشتی چ وەڵامێکت دەبێ؟ وتی: دەڵێم، خودایە بە گوێرەی زانیاری خۆت منت لەنێویاندا بەجێ هێشت، ئەمجا کە منت بۆ لای خۆت گێڕایەوە خۆتیان لەنێو دابووی، بە ویستی خۆت دەتتوانی چاکت کردبانایەو ئەگەر ویستیشت لەسەر بووایە گەندەڵو خراپ دەبوون، بەپێی ڕیوایەتێکی تر: دەڵێم: بەپێی زانیاری خۆت ئەوەندەی ویستت لەسەر بوو کردتم بە خەلیفە بەسەریانەوە، ئەمجا گیانت کێشامو بۆ لای خۆت گێڕامەوەو، منیش تۆم لەنێویاندا بەجێهێشت... ئیتر دوای ئەوە کوژرا، (حسن ی کوڕی علی) نوێژی لەسەر کردو، چوار جار -لە نوێژەکەیدا- (ألله أكبر)ی بەسەردا لێداو لە کوفە نێژرا، یەکەم کەس کە بەیعەتی بە (حسن)دا (قیس ی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادەی خەزرەجی) بوو، پێی وت: دەستت درێژ بکە تا لەسەر کتێبی خودای مەزنو بە دەسەڵاتو سوننەتی پێغەمبەرەکەیو کوشتاری خوێن حەڵاڵکەرانی خەواریج بەیعەتت پێ بدەم، (حسن) (ڕەزای خوای لێ بێت) پێی وت: تەنها لەسەر کتێبی خوداو سوننەتی پێغەمبەرەکەی، ئەمە لە پشت هەموو مەرجێکەوەیە، جا بەیعەتی پێداو بێدەنگ بوو، ئیتر خەڵکیش بەیعەتیان پێدا،[1] کاتێك خەڵکی (عێراق) ویستیان بەیعەتی پێ بدەن، (حسن) مەرجی لەسەر دانانو پێی وتن: ئێوە گوێڕایەڵو فەرمانبەردار دەبن، ئاشتیم لەگەڵ هەر کەسێك کرد دەبێ ئاشتی لەگەڵ بکەن، جەنگم لەگەڵ هەر کەسێك کرد دەبێت لە دژی بجەنگن.[2] بەپێی ڕیوایەتێکی تر پێی وتن: بە خودا تەنها بەو شێوەیەی کە پێتان دەڵێم بەیعەتتان لێ وەردەگرم، وتیان: چیە؟ وتی: ئاشتیم لەگەڵ کێ کرد ئاشتی لەگەڵ دەکەنو جەنگم لە دژی کێ کرد جەنگی لە دژ دەکەن.[3]

بەپێی ڕیوایەتی (إبن سعد): دوابەدوای -شەهیدبوونی- علی، (حسن ی کوڕی علی) دوو بەیعەتی لە خەڵکی (عێراق) وەرگرت: یەکەم: لەسەر ئەمیرایەتی، دووەم: بەیعەت لەسەر ئەوە بوو کە ئەو چووە نێو هەر ئاشتیەکەوە ئەوانیش بێنە ناویەوەو، ئەو بە چ ڕازی بوو ئەوانیش پێی ڕازی دەبن.[4]

---

١ تأريخ الطبري (٧٣/٦).
٢ تأريخ الطبري (٧٧/٦).
٣ الطبقات، تحقيق د. محمد السلمي (٢٨٦/١، ٢٨٧).
٤ المصدر نفسه (٣١٦/١، ٣١٧).

٦ـ شێوازی بەستنی بەیعەت بۆ (معاویەی کوڕی أبی سفیان) (ڕەزای خوای لێ بێت):
بـە خۆشـبوونی (حـسن ی کـوڕی علـی) لـە مـافی ڕەوای خـۆی‌و دابـەزینی لـە پۆسـتی (خیلافەت) بۆ (معاویە)، بەیعەتی خیلافەت -بە هاریکـاری یـەکانگیربوونی هۆکارەکـان- بـۆ (معاویە) بەستراو لە ساڵی ٤١ کۆچیدا بە سیفەتی (ئەمیری ئیمانداران) بەیعەتی پێدراو، ئـەو ساڵە ناوی لێنرا ساڵی جەماعەت،[١] ئەمەو هەموو ئەو هاوەڵانەی لە ژیانـدا مـابوون بەیعـەتیان پێداو، ئوممەت لەسەر ئەو کۆك‌و یەکانگیر بوو، دانیان بە شەرعیەتی خیلافەتەکەیدا هێنـاو، بـە پێـشەوایەتیەکەی قایـل بـوون‌و، پێیـان وابـوو ئـەو -لـەو سـەردەمە هەسـتیارەدا- بـۆ سەرپەرشتیکردنی کاروباری موسڵمانان لـە هـەموو کـەس باشـترەو، دەتوانێـت بـە باشـترین شێواز ڕاپەڕێنێت.

٧ـ ڕەخنەکانی سەر بیری (ویلایەتی عەهد)ی سەردەمی (معاویە):
ڕاسـتە کـە سیـستەمی حـوکمڕانی ئیـسلامی بـە ئامـانجی هەڵبـژاردنی سەرپەرشـتیکاری کاروبار دەقی لەسەر ڕێباز یان شێوازێکی دیاریکراو نیە، بەڵام بناغەیەکی بـۆ دارشـتوون کـە بە هیچ شێوەیەك بێ لە حاڵەتی ناچار دەنا دروست نیە لەسەر سکەی ئەو بناغە لابرێت، کە بریتیە لە (شورا)، شوراش شێوازێکی تایبەت‌و بە تەنها تاکە ڕێبازێکی نیە تا بەبێ ئەو نـەبێ نەیەتـەدی، بـەڵکو بـە چـەندین شـێواز دێتـەدی، هـەروەك چـۆن لـە هەڵبـژاردنی خەلیفـە ڕاشیدەکان لە لایەن (ئوممەت)ەوە ئەمەمان خوێنـدەوە، خـۆ ئەگـەر (معاویـە) بـە داهێنـانی بیری (ویلایەتی عەهد) لە (سیستەمی حوکمڕانی ئیـسلامی)دا مەبەسـتی یەکخـستنی بڕیـاری موسڵمانان‌و بەرگرتن بە ڕژێنرانی خوێنیان بوبێت، ئەوا بە ویستی خودای باڵا پاداشتی پـێ دەدرێـت، هەرچـەندە ئـەو دەیتـوانی پـەیمانی (پۆسـتی خیلافـەت)ی دوای خـۆی نـەدابا بـە کوڕەکەی‌و بیدابا بە یەکێك لەو گەورە هاوەڵانەی ئەو سەردەمە کە بۆ بەڕێوەبەرایـەتیکردنی ئەو ئەرکە گرنگە شیاو بوون، لەو دەمەدا: (حسین ی کوڕی علی‌و، عبدالله ی کـوڕی زوبێـرو، عبدالرحمن‌ی کوڕی أبی بکرو، عبدالله ی کوڕی عمرو، چەندین کەسایەتی تر) هەبوون‌و توانا‌و ئامادەییان تێدا بوو، بەڵام (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) هەموو ئەمانـەی بـواردن‌و لای بـە لای کوڕەکـەی خۆیـدا کـردەوە تـا لـە دوای خـۆی ببێتـە (خەلیفـە)، بـەم جـۆرە سیـستەمی حـوکمڕانی ئیـسلامی لـە نێوەڕۆکیـدا گـۆڕانی بەسـەردا هـات، گۆڕانەکـە بـە هـۆی داهێنـانی سیستەمی (ویلایەتی عەهد) دروست نەبوو، بەڵکو بە هۆی ئەوەوە کە (وەلی عەهد) بریتیە لە

---

١ سیر أعلام النبلاء (٣/١٣٧)، تأریخ خلیفة (٢٠٣).

(کوڕ) یان یەکێك لە خزمەکانی (خەلیفە)و کار بەوە گەیشت (حوکومەت) دوای ئەوەی کە بریتی بوو لە (خیلافەتی ڕاشیدە) گۆڕانی بەسەردا هات‌و بوو بە (مەلەکییەت‌و پاشایەتی).[١] خۆ ئەگەر ئێمە شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەری خودا (ﷺ)و (خەلیفە سەرڕاست‌و بەرچاو ڕوون‌و ڕێنماکراوو ڕێنماکەرەکان)مان لەسەر پێویست کرابێت، ئەوا تەماشا دەکەین (سیستەمی ویراسە) نە لە سوننەتی پێغەمبەرو نە لە ڕێ‌و شوێنی خەلیفە ڕاشیدەکانیدا بوونی نیە، هەروەك چۆن پاڵێورانی (یەزید) لەبەر چەند هۆیەك سەرکەوتوو نەبوو، لەو هۆیانە: لە کۆمەڵگای ئیسلامی ئەو ڕۆژگارەدا کەسانێکی وەك (عبدالله ی کوڕی عمرو عبدالله ی کوڕی عباس‌و کەسانی تریش) هەبوون‌و لە بوارەکانی سابیقەو زانست‌و چالاکی‌و جێگەو پێگەو پلەی هاوەڵایەتیدا لە پێش (یەزید)ەوە بوون‌و بۆ وەرگرتنی پۆستی (خیلافەت)یش شایانتر بوون‌و لە بەرانبەر (یەزید)دا نێوانیان ئاسمان‌و ڕێسمان بوو،[٢] ئیدی دەبووایە یەکێك لە ئەوانی دیاری کردبایە –هەرچەندە لە سیستەمی (حوکمڕانی ویراسە)شدا دەبووایە کوڕ میراتی باوکی بگرێتەوە، بەڵام لە سەرووی هەموو پێوانەیەکەوە بە پێی عەقیدەی (ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت) ئەمە بۆی نابێ بە لەکەیەکی زۆر گەورە، ئەمە لە کاتێکدا (ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت) نە (معاویە)و نە کەسانێکیش کە لە پلەو پایەدا لە ئەو بەرزتر بوون بە پاکیزەو بێ گوناه دانانێن، وێڕای ئەمە کە لە ئیجتیهادکردنیشدا ناڵێت هەڵەیان نەکردووە، بەڵکو دەڵێن: هۆکارگەلێکی وەك (تۆبەکردن‌و داوای لێخۆشبوون و کردەوەی چاکەو بەڵاو موسیبەت‌و شتانی تریش) هەن دەبنە مایەی سڕینەوەی گوناهەکان‌و هەڵگرتنی سزا لەسەر بکەرەکانیان، ئا ئەمە هاوەڵان‌و خەڵکانی تریش دەگرێتەوە.[٣]

هەرچی (معاویە)یە (ڕەزای خوای لێ بێت) باشترینی ئەو پاشایانەیە کە دادپەروەریان بەسەر ستەمیاندا زاڵ بووەو لە سیفەتگەلی شەڕیش بەری نەبووەو هومێد وایە خودا لێی خۆش بێت.[٤] پێویستە لەسەرمان بیروباوەڕمان سەبارەت بە (معاویە) ڕاست‌و دروست بێت‌و دڵ‌و دەروونمان لە بەرانبەر ئەوو هیچ کامێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) کرمێ نەبێت‌و ڕق‌و قینی تێدا نەبێت‌و بڵێین: ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ

---

١ الأمويون بين الشرق والغرب، للوكيل (١/١٨٠).
٢ تأريخنا المفترى عليه، للقرضاوي (ص: ٢٥٠).
٣ منهاج السنة (٤/٣٨٥).
٤ سير أعلام النبلاء (٣/١٥٦).

لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَا تَجْعَلْ فِى قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٠﴾﴾[1] واتە: ئەوانەی بە دوای ئەوان (هاوەڵان)دا دێن دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان! لە ئێمەو ئەو برایانەمان خۆش بە کە بەر لەمە بە ئیمانەوە پێش ئێمەیان دایەوەو ڕابوردن، بە هۆی دنەی شەیتانو خراپی خۆمان لەگەڵ نەکەیو ڕقو کینەمان لە دژی ئەوانەی ئیمانیان هێناوە نەخەیتە نێو دڵەوە، ئەی پەروەردگارمان! بە ڕاستی تۆ بە بەزەییو میهرەبانی.

دەڵێین: (معاویە) لە ترسی ڕوودانی ئاشوبو پەرتەوازەبوونی موسڵمانان هاتو ئەم ئیجتیهادەی –بە حیسابی خۆی– بۆ بەرژەوەندی ئوممەت دەرکرد، ناکرێتو نابێت تۆباڵی هەڵەو تاوانی پاشاو میرانی دوای خۆی بخەینە ئەستۆی ئەوو لاسای کەسانی وەك (عبدالقادر عودة) (بەر ڕەحمەتی خوا بکەوێت) بکەینەوە، ئەو دەڵێ: (معاویە) کاروباری ئوممەتی ئیسلامی لەسەر بنەمای (ستەمو بەهەدەردانی ماف) قیت کردەوە، کۆتایی بە (شورا) هێناو ئەم فەرموودەیەی خوای پەك خست: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ﴾[2] واتە: کاروباریان بە (شورا) دەبێ لەنێو خۆیاندا، حوکمی پاكو خاوێنو دادپەروەری گۆڕی بۆ حوکمێکی قێزەون کە لەسەر ئەستوونی ڕای شەخسیو ئارەزوو هەڵچنرابوو، خەڵکی بەرەو دووڕوویی‌و داماویو سەرشۆڕی ئاراستە کرد، هیچ گومان لەوەدا نیە کە هەموو ئەو حوکمڕانانەی بێ لە (عمری کوڕی عبدالعزیز) لە دوای ئەوەوە تا سەردەمی ئێمە هاتوونو کاریان بە پەیڕەوەکەی ئەو کردەوەو خوویان بە نەویاو (بیدعە)ەکەی ئەوەوە گرتووە، ئەوا بەبێ ئەوەی هیچ لە تاوانەکانیان لەسەر کەم بێتەوە هەر هەموویان تاوانەکانیان هەڵدەگیرێنو بە کۆڵی (معاویە)دا دادەدرێن، چونکە ئەو ئەم ڕێو شێنە بەدەی داهێناو، دەبێ تاوانەکەیو تاوانی هەر کەسێکیش پەیڕەوی لێ دەکات هەتا ڕۆژی قیامەت بە ئەستۆی ئەو بێت،[3] ئەگەر (معاویە) یان خەلیفەکانی (ئومەوی) سیستەمی (خیلافەت)یان لە شوراوە گۆڕیبێت بۆ مەلیکایەتی، ئەوا دەبینین نەوەکەی کە دەکاتە (معاویەی کوڕی یەزیدی کوڕی معاویەی کوڕی أبی سفیان)ی سێهەم خەلیفەی (ئومەوی)، خیلافەتی لە مەلیکایەتی خۆسەپێنەوە بەرەو شورای تەمامعەیار گێڕاوەتەوە، کەواتە لە باتی ئەوە کە هەر گرنە لەسەر بەشی یەکەمی بابەتەکە بگرین کە بریتیە لە کردنی (خیلافەت) بە (پاشایەتی)وماڵەمیراتی، ئەوا

---

١ الحشر (١٠).

٢ الشوری (٣٨).

٣ الاسلام وأوضاعنا السياسية (ص: ١٥٩).

ویژدان پێمان دەڵێ پێویستە بابەتەكەلەسەر بەشی دووەم بینا بنرێت كە (معاویە)ی نـەوەی (معاویە) ئەنجامی داوە، بەڵام چارە چیە كە ئوممەت نەیتوانیبێت مافی هەڵبـژاردنی خەلیفـە -كـە لـە سـەردەمی (ڕاشـیدە) پێـی درابـوو- بـۆ خـۆی وەربگرێتـەوە، بـە شـێوەیەك لـە شـێوەكانی پێـشدا جێبـەجێی بكـات، ئـیتر بـە ئاشـكرا ناوچـەگەریو تایەفەگـەری لـە یەكلاییكردنەوەی ململانێی دەورەی پۆستی (خیلافەت) ڕۆڵی بەرچاوو كاریگەریان گێڕاو، بە باری بەرژەوەنـدی بنەماڵـەی (ئومـەوی)یـان وەرسـوڕاند، (شـام) بـە هـۆی یـەكگرتنی هـۆزو تایەفەكانیو هەبوونی بنەماڵەی ئومەوی تیایدا، تـوانی یەكلاكردنـەوەی مێـژوویی بەدەسـت بێنێت.[1]

لەمەولا -بە ئیزنی خودا- بە درێژی قسە لەسەر (معاویەی دووەم) دەكەین، لـە ڕاسـتیدا خەڵكێكی زۆر هەتا بە هاوەڵانیشەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) بەیعەتەكـەی یەزیـدیان پەسـند كردو شەست هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ) بە (عبدالله ی كوڕی عمـر)یـشەوە لـە ترسـی ڕوودانـی ئاشوبو داكۆكیكردن لەسەر یەكڕیزی بەیعەتیان پێدا.[2]

دوابەدوای دەرچوونی (معاویە) لە مەدینە: (عبدالرحمن ی كوڕی أبی بكـر) كۆچـی دوایـی كردو، بە تەنها سێ كەسایەتی -كە بریتی بوون لە (عبدالله ی كوڕی عمرو، عبـدالله ی كـوڕی زوبێرو، حوسێنی كوڕی عـەلی) لـە گۆڕەپـانی بەرهەڵـستكاریدا مانـەوە، دوای كۆچـی دوایـی (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت)، (عبـدالله ی كـوڕی عمـر) تەماشـای كـرد خـەڵك لـە دەورەی (یەزید) كۆبوونەتەوە، بۆیە (بە وەكالەت) بەیعەتی خۆی بۆ (یەزیـد) بـەڕێكردو وتـی: ئەگـەر چـاك بێـت پێـی ڕازی دەبـینو ئەگـەر بـەلاش بێـت ئـارامی لەسـەر دەگـرین،[3] ئـیتر بازنـەی بەرهەڵستكاری لەسەر دوو كەسایەتی -واتە عبدالله ی كوڕی زوبێرو حوسەینی كوڕی عـەلی- (ڕەزای خوایان لێ بێت) تەسك بۆوە، خەڵكانێك هـەوڵیان داوە بوختـان بـە (معاویـە) بكـەنو دەڵێن گوایە لە بەرانبـەر بەیعەتـدان بـە (یەزیـد) پەشـیمان بۆتـەوە، ئـەم وتەیـەیان بـە دەم ئـەوەوە هەڵبەسـتووە: ئەگـەر (یەزیـدم) هێنـدە خـۆش نەویـستبایە بەرچـاوی ئـەقڵم ڕوون دەبوو.[4] زنجیرە سەنەدی ڕیوایەتەكە لە ڕێی (واقیدی)یەوەیە كـە مەتروكـە.[5] هـەروەها ئـەم

---

١ الدولة الأموية المفترى عليها (ص: ٢٩٣، ٢٩٤، ٢٩٥).

٢ القيد الشريد ورقة (١٧)، نقلا عن مواقف المعارضة (ص: ١٥٣).

٣ مصنف إبن أبي شيبة (١١/١٠٠)، بسند صحيح.

٤ أنساب الأشراف (٢٨/٤).

٥ مواقف المعارضة (ص: ١٥٢).

وتەیەشیان داوەتە پاڵ کە گوایە بە (یەزید)ی وتووە: کاتێك دەگەمەوە بە (خودا) هیچ کارو کردەوەیەکم پێ نیە بە قەد ئەم کردەوەیە گەورە بێت کە تۆم لە جێی خۆم بۆ پۆستی خیلافەت داناوە.[1] زنجیرەی سەنەدی ئەم ڕیوایەتەش لە ڕێی (هەیسەمی کوڕی عەدی)یەوەیە کە درۆزنە.[2] (محمد رشید رضا) -بەر ڕەحمەتی خوا بکەوێت- پشتی بەم ڕیوایەتە بەستووەو هێرشێکی دڵڕەقانەی کردۆتە سەر (معاويە).[3] لە ڕاستیدا زۆرێك لە لێکۆڵەران بە هۆی ئەم ڕیوایەتە زەعیفو هەڵبەستراوانەی پەیوەست بە (مێژووی سەرەتای ئیسلام)ەوە تێوەگلاونو جۆرە حوکمو بیروبۆچوونگەلێکیان لەسەر بیناکردوون کە پێویستیان بە ئاوڕلێدانەوەو چاوپێداخشاندنەوەی سەرلەنوێ هەیە.

لەگەڵ ئەوەشدا کە لادان ڕوویداو گۆڕان بەسەر (خیلافەت) کە بەرزترین نموونەی (سیستەمی حوکمڕانی ئیسلامی) بوو داهێنراو دوای ئەوەی کە پڕ بە پێستی خۆی (ڕوحی ئیسلام)ی تێدا بەرجەستە ببوو، گۆڕدرایەوە بە دەسەڵاتی پاشایەتی خۆسەپێنەر.[4]

بەڵێ لەگەڵ ئەمەشدا سروشتی ئیسلامی بەسەر ڕواڵەتی دەوڵەتداریو هەڵسوکەوتی حوکمڕانەکاندا زاڵ ببوو، نوێژەکان لە کاتەکانیان بەرپا دەکران، زەکات لە زەکاتدەران وەردەگیرا، ڕۆژوو فەرزێك بوو کەس نەبوو لە بەرانبەر گرتنیدا لامو جیم بکات، هیچ کامێك لە سزا شەرعیەکان(حدود) ڕاپەڕاندنیان پشتگوێ نەدەخرا، جیهادی ڕێگای خودا تا قیامەت بە فەرزێکی سەر شانی پیاوان حیساب دەکراو بە گشتی ڕێنماکانی ئیسلام سەرتاپا جێبەجێ دەکران.[5]

## حەوتەم: دواین ڕۆژەکانی ژیانی (معاويە):

١ـ وەسێتی (معاويە) (ڕەزای خوای لێ بێت) بۆ (یەزید):

ساڵی ٦٠ی کۆچی مەرگ بوو بە میوانی (معاويە)، لەو دەمەدا (یەزید) لە سەفەردا بوو، (معاويە) بانگی (زوحاکی کوڕی قەیسی فەهری)-ی سەرۆکی پۆلیسەکانو- (موسلیمی کوڕی عوقبەی موری) کردو، وەسێتی بۆ کردنو پێی وتن: ئەم وەسێتە بە (یەزید) ڕاگەیەنن: چاوت لە دانیشتوانی (حیجاز) بێ، چونکە ئەوان بنەچەکەتن، هەر کەسێکیان

---

١ أنساب الأشراف (٤/٦٠).

٢ مواقف المعارضة (ص: ١٥٢).

٣ مواقف المعارضة في خلافة يزيد (ص: ١٥٢)، الخلافة: محمد رشيد رضا (ص: ٥٢).

٤ كيف نكتب التأريخ الإسلامي (ص: ١١٢).

٥ الأمويون بين الشرق والغرب (١:٤٩، ٤٥).

سەردانی کردی ڕێزی تەواوی لێ بنێ، بە چاکەش ڕەفتار لە بەرانبەر کەسە نادیار–و نەهاتووەکانیان بۆ لات– بنوێنە، بڕوانە دانیشتوانی (عێراق)، کە داوایان لێکردی هەر هەموو ڕۆژێك کاربەڕێوەبەرێکیان بۆ لێبخەی، بە قسەیان بکە، چونکە لادرانی کاربەدەستێکم پێ خۆشترە لەوە کە سەد هەزار شمشێر لە دژت ڕاست بکرێتەوە، تەماشایەکی خەڵکی شام بکە، با ئەوانە ببن بە دۆستو پشتیوانو ڕازپارێزت، ئەگەر نەیارانت گێچەڵیان پێ کردی، بە هۆی ئەوانەوە هەوڵی سەرکەوتن بدە، ئەگەر بەسەریاندا سەرکەوتی بەخێرایی خەڵکی (شام) بۆ وڵاتی خۆیان بگێڕەوە، چونکە ئەگەر ئەوان لە غەیری وڵاتی خۆیان نیشتەجێ ببن، خوو بە غەیری ڕەوشتی خۆیانەوە دەگرن، من لە هۆزی قورەیش ناترسم جگە لە سێ کەسیان: (حوسێنی کوڕی عەلی، عبداللە ی کوڕی عمر، عبداللە ی کوڕی زوبێر)، هەرچی (عبداللە ی کوڕی عمر)ە بەندایەتیەکەی گۆشەنشینی کردووە و ڕووبەڕووت نابێتەوە، بەڵام (حوسێنی کوڕی عەلی) پیاوێکی بارسووکە، هومێد دەکەم خودا بە هۆی سەرگەرمبوونی بە ئەوانەوە کە باوکیان کوشتو براکەیان داماو کرد لە ئێقەی تۆی بکاتەوە، چاك بزانە: (حوسێن) سیلەی ڕەحمی لەگەڵت هەیە، مافێکی گەورەی –بەسەر تۆو هەموو لایەکەوە– هەیە، لە (محمد) (ﷺ)ەوە نزیکە–و کچەزایەتی–، گومان نابەم خەڵکی (عێراق) تا بە دەری نەنێن کۆڵی لێدەن، ئەگەر تۆ دەسەڵاتت بەسەر ئەودا شکا، چاوپۆشی لێ بکەو لێی ببوورە، ئەگەر من هاوتای ئەو دەبووم لێی دەبووردام، بەڵام هەرچی (عبداللە ی کوڕی زوبێر)ە، فێڵبازو بەقۆڵتو پێچە، ئەگەر بەرەو ڕووت بۆوە، بۆی بچۆ بۆسەوە، مەگەر لە حاڵێکدا داوای ئاشتی لێکردی، ئەگەر ئەمەی کرد لێی قبوڵ بکە، هەتا دەتوانی‌و بۆت دەلوێ خوێنی عەشیرەتەکەت لە ڕژان بپارێزە،[1] (معاویە) لەم وەسێتەیداو لە میانەی ئامـاژەدانی بە گرنگی وڵاتەکانو مەودای کاریگەرییان لەسەر ئایندەی ڕەوشی دەوڵەتی ئومەوی، سیاسی بوونو زۆرزانی‌و لێوەشاوەیی خۆی خستەڕوو، تەنها باسی سێ وڵاتی (حیجازو عێراقو شام)ی کرد، چونکە تا ئەو کاتە ڕەوشە سیاسیەکانی دەرەوەی بازنەی ئەم هەرێمانە هیچ خەمێکی جیددییان بۆ دروست نەکردبوو.[2]

أ- حیجاز: سەبارەت بە (حیجاز) معاویە وەسێت بۆ (یەزید)ی کوڕی دەکاتو دەڵێ: تەماشای دانیشتوانی (حیجاز) بکە، ئەوان ئەسڵی نەسەبی تۆن، هەر یەکێك لەوان سەردانی

---

١ تأريخ الطبري (٦/٢١٤).

٢ الوصية السياسية في العصر العباسي، حقي إسماعيل (ص: ٤٦).

كردی ڕێزی تەواوی لێ بگرەو، ئەوەی نەهات بۆ لاتو -دیار نەبوو- ئاگات لێ بێ‌و چاكەی لە بەرانبەردا ئەنجام بدە.[1]

وێڕای ئەمە كە (حیجان) زێدی كەسوكارو هۆزەكەیەتی، بایەخی (معاویە) بەو وڵاتە لەوەوە سەرچاوە دەگرێت: كە ماوەیەك بەر لە ئێستاو لە ڕووی سیاسیەوە چەقی قورسایی دەوڵەتی ئیسلامی بووەو، لە بواری (ئاینی)یشەوە بە هۆی بەرچەیاتبوونی ژمارەیەك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) لەوێدا مەڵبەندی سەرەكی فتواو بڕیارە شەرعیەكانەو بەردەوامیش شوێنی ڕاستەقینەی بەستنی بەیعەتدانە، ئەگەر هەلی بۆ بڕەخسێت‌و بڕیاری خۆی یەك بخات دەتوانێت حكومەتی (ئومەوی) بڕوخێنێت.[2] لەمەش گرنگتر -كە لە بڕگەكانی دواتری وەسێتەكەدا دەیخوێنینەوە- ئێستا (حیجان) بۆتە مەڵبەندو پەناگای ژمارەیەك كەسایەتی بەرهەڵستكاری حكومەتی (ئومەوی) وەك (حوسێنی كوڕی عەلی‌و عبدالله ی كوڕی عومەرو عبدالله ی كوڕی زوبێرو عبدالله ی كوڕی عەباس) (ڕەزای خوایان لێ بێت)، لەبەر ئەمەو بە خاتری بە دەستەوەگرتنی جڵەوی كاروباری (حیجان) (معاویە) هانی (یەزید) دەدا چەندین ڕێ‌و شوێنی پێویست بگرێتە بەرو بە تایبەتیش دەبێ سەروەت‌و سامانێكی زۆر هەڵڕێژێت،[3] لەبەر ئەم هۆیانە (معاویە) دەسەڵاتی ئەو هەرێمەی ڕاستەوخۆ خستە ژێر چاودێری خودی خۆیەوەو، جێبەجێكردنی كاروباری سیاسی ئەوێی بە كەسانی بنەماڵەی ئومەوی دەسپاردو، -جگە لە چالاكی سیاسی دژ بە خۆی- هانی خەڵكی دەدا لە هەموو بوارەكاندا چالاكیەكانی خۆیان لەو هەرێمەدا پەرە پێ بدەن‌و[4] لەو نێوەشدا بایەخێكی تایبەتی بە كەسوكاری خۆی دا.

ب ـ عێراق: دووەمین هەرێم كە دەبێتە جێی بایەخی (معاویە) (عێراق)ە، بۆیە وەسێت بۆ (یەزید)ی وەلی عەهدی دەكات بە شێوەیەكی تایبەت ڕەفتار لەگەڵ خەڵكی ئەو هەرێمەدا بكات‌و پێی دەڵێت: سەیری دانیشتوانی (عێراق) بكە، ئەگەر داوایان لێكردی هەموو ڕۆژێك والیەكیان بۆ بگۆڕی، بۆیان بگۆڕە، چونكە لابردنی والیەكم بە لاوە ئاسان‌و خۆشترە لەوە كە سەد هەزار شمشێرت لە دژ ڕاست بكرێتەوە،[5] شایانی وتنە كە هەر لە سەردەمی (عمری

---

١ تأريخ الطبري (٦/٢٤١).

٢ الوصية السياسية في العصر العباسي (ص: ٤٦).

٣ المصدر نفسه (ص: ٤٦).

٤ المصدر نفسه (ص: ٤٦).

٥ تأريخ الطبري (٦/٢٤١).

کوڕی خطاب) (ڕەزای خوای لێ بێت) نەریتی سکاڵای خەڵکی (عێراق) لە دژی والیەکانیان سەری هەڵدابوو.

ج ـ شام: سێهەمین جار باسی شام دەکات بە حوکمی ئەوە خەڵکی شام ڕۆڵی گەورەیان لە سەرخستنی بۆ سەر کورسی دەسەڵات گێڕابوو، بە بەردەوامیش پشتیوانیان لە سیاسەتەکانی ئەو دەکرد، (معاویە) وەسێت بۆ (یەزید) دەکات بە باشی پاداشتیان بداتەوەو بایەخی تەواویان پێ بداتو بیانکاتە جێ متمانەی خۆیو، بۆ ڕۆژانی تەنگانەو ئەنجامدانی کارە گرنگەکانیان دابنێو پێی دەڵێت: بڕوانە دانیشتوانی (شام)و با ئەوان ببن بە دۆستی گیانی بە گیانیو هەڵگری نهێنیەکانت، هەر کە زانیت دوژمن دەیەوێت زەفەرت پێ بەرێ، بە هۆی ئەوانەوە سەرکەوتن بە دەست بهێنە، هەر کە زاڵ بووی خێرا ئەوان بەرەو شام بگێڕەوە، چونکە ئەگەر لە وڵاتێکی تر نیشتەجێ ببن، دابونەریتی خەڵکی ئەو وڵاتە وەردەگرنو واز لە کلتوری خۆیان دێنن.[١]

ئەم برگەی دوایی –کە مەترسی (معاویە)ی لە خۆگرتووە لە ئاست تێکەڵاوبوونی خەڵکی (شام) بە خەڵکی وڵاتانی تر– سیاسی بوونو دوورخوێندنەوەی (معاویە)مان بۆ دەردەخات،[٢] چونکە ئەگەر سەربازانی (شام) بۆ ماوەیەکی درێژخایەن لەو وڵاتانەدا بمێننەوە، لەوانەیە لە لایەن نەیارانی دەوڵەتی (ئومەوی)یەوە کاریگەریان بکەوێتە سەرو هەموو ئەو بەرژەوەندیە هاوبەشانەیان بەلادا بخەن کە لەگەڵ ئومەویەکان هەیانەو ئەو کارتە قازانجبەخشە لە دەست ئومەیەکان بکەوێتە خوارەوە، کە بەردەوام (معاویە) بە کاری هێناوەو بەرهەمەکەشی چنیوەتەوە، لەبەر ئەمە (معاویە) وەسێت بۆ (یەزید)ی کوڕی دەکات: کە هەر کاتێك سەربازانی (شام) کارو چالاکیەکانیان ڕاپەڕاندن، پێویستە خێراو بێ دواکەوتن بەرەو (شام) بیانگێڕیتەوە.[٣]

گرنگترین شت لە وەسێتەکەیدا بریتیە لەو نەخشەیەی بۆ وەلی عەهدی خۆی کێشاوە تا بتوانێت بە هۆیەوە بەرەنگاری ڕووداوە چاوەڕوانکراوەکانی داهاتوو ببێتەوەو ڕایسپارد ئەو کارەی ئەو –بە خودی خۆی– نەیتوانی بیکات لە قەناعەت پێکردنی چەند کەسایەتیەکی قوڕەیشی لە حیجاز بۆ پێدانی بەیعەت بە (یەزید) ئەوا ئەو –واتە یەزید– پێویستە بیکا،

---

١ المصدر نفسه (٦/٢٤١).

٢ الوصية السياسية في العصر العباسي (ص: ٤٦).

٣ المصدر نفسه (ص: ٤٨).

ئەمە لەگەڵ ئەوەدا کە ڕیوایەتەکان باس لەوە دەکەن کە (معاویە) بۆ ئەم مەبەستە بەرەو (حیجاز) چووەو یەك بە یەك لەگەڵ هەموو ئەو کەسایەتیانە کۆبوونەوەی کردووە کە بەیعەتەکەی (یەزید)یان ڕەفز کردبوو، هەوڵیدابوو هەرچۆنێك بێ ئەمجارەش قەناعەتیان پێ بکات‌و بەڵێنی بەیعەتدانیان بۆ (یەزید) لێ وەربگرێت،[1] بەڵام هەموو ئەو هەوڵانە نەیانتوانی پێشوەخت بەر بە بەرزبوونەوەی ئەو ئاستەنگانە بگرن.[2]

بە گوێرەی ئەم وەسێتە: (حیجاز) بە تایبەتی (مەدینە) لە بەرانبەر (حکومەتی ئومەوی) لە هەر هەموو وڵاتانی تر نەیارترە، بۆیە (معاویە) داوا لە (یەزید)ی کوڕی دەکات لە میانەی هەڵسوکەوت‌و ڕەفتاریدا لە بەرانبەر شاری مەدینەو وڵاتی حیجاز وردو وریا بێت‌و، هەر کاتێکیش توندو تۆڵی پێویست بوو لەسەر پابێ‌و، تا بۆی دەکرێت لە بەرانبەر کەسانێکیش ترسێکی ڕاستەقینەی بۆ دروست ناکەن نەرم‌و نیان بێت، هەموو ئەمە بە خاتری ئەوە کە (حیجاز) بایەخێکی یەجگار زۆری لە چەسپان‌و بەرقەراربوونی پایەکانی حوکمدا هەیە.[3]

(معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) لە هەموو بۆچون‌و پێشبینیەکانیدا پێکای، قسەکەی سەبارەت بە (عبدالله ی کوڕی عمر) ڕاست دەرچوو کە ئەو مرۆڤێکە دینداریەکەی گۆشەگیری کردبوو هیچ ترسێکی بۆ سەر (یەزید) نیە، کاتێك (وەلیدی کوڕی عوقبە) داوای پێدانی بەیعەتی لێکرد وتی: هەر کات خەڵك ‒بە گشتی‒ بەیعەتیان دا بەیعەت دەدەم، جا چونکە دەیانزانی چاوی لە کورسی دەسەڵات نیەو خۆی بە (پەرستن)ەوە سەرگەرم کردووە کۆڵیان لێدا،[4] لەم پێشبینیەشیدا پێکای کە: خەڵکی (عێراق) واز لە (حوسێنی کوڕی عەلی) ناهێنن هەتا بە دەری نەنێن، لەوەش دڵنیابوو کە ڕووبەڕووبوونەوە لە نێویاندا ڕوو دەدات، لەبەر ئەمە داوای لە (یەزید) کرد هەر کاتێك بەسەریدا سەرکەوت لێی ببوورێت، بەڵام خەتەری ڕاستەقینە ‒بە بۆچوونی معاویە‒ کە گورج‌و گۆڵی‌و توندوتیژی بخوازێت، خۆی لە (عبدالله ی کوڕی زوبێر)دا نیشان دەدا، چونکە ئەو کەسایەتیەکە لە لایەن زۆرینەی نەیارانی (حوکمڕانی ئومەوی)یەوە پشتگیریەکی بەهێزو بەرفراوانی لێ دەکرێت‌و بە خودی خۆشی پیاوی پلەیەکی هەردوو گۆڕەپانی سیاسەت‌و جەنگە. بە تێکڕا وەسێتەکەی (معاویە) ئاوێنەیەکە سیاسەت‌و زۆرزانی‌و شارەزایی بەرفرەی ئەو بە واقیع‌و پێشهاتەکان نیشان

---

١ المصدر نفسه (ص: ٤٨).

٢ المصدر نفسه (ص: ٤٨).

٣ المصدر نفسه (ص: ٤٩).

٤ أنساب الأشراف (٤/١٤).

دەدات، دەبینین لە میانەی وەسێتەکەیدا مامەڵە لەگەڵ ڕووداوەکان دەکاتو هەر ڕووداوێك توندوتیژی بخوازێت دەبێ خۆی بۆ توندو تۆڵو تەیار بکرێتو ڕووداوێکی تریش نەرمونیانی بخوازێت دەبێت باوەشی بۆ بکرێتەوەو هەروەها، ئەو لێرەدا شارەزاییو ئەزموونی دوورو درێژی خۆی لە بەرانبەر ڕووداوەکاندا بەکار دەخات، بەم وتەیەی پێناسەی سیاسەتی خۆی دەکاتو دەڵێ: تا شوڕکەداری دەستم بەشم بکات شمشێرەکەم دەرناکێشم، کە زمانیش بەشم بکات گۆچانەکەم ناوەشێنم، ئەگەر موویەکی باریك لە نێوان منو خەڵکدا بوویێت هەرگیز نەپساوە، پرسیاری لێکرا: چۆن؟ وتی: ئەگەر ئەوان بە لای خۆیاندا ڕاکێشابێت لە دووم داون، ئەگەر شلیان کردبێت ڕامکێشاوەو گشتم کردووە.[1] هەمیشە ئامۆژگاری (یەزید)ی دەکرد پەیڕەوی لەم سیاسەتەی بکاتو پێی دەوت: حەلیمو نەرمونیانو لێبوردە بە، تا کار بەوە دەگات دەرفەت دەخوازیو دەستت دەڕوات، کە دەستت ڕۆیشت چاوپۆشی ڕەوچاو بکە، چونکە چاوپۆشی بەلاگێڕەرەوەیەو، لە گرفتو ناگوزوریو گێرەوکێشە نەخوازراوەکانت دەپارێزێت.[2] (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) لەم وەسێتەیدا ئەزموونی سیاسیو ئیداری خۆی بۆ (یەزید)ی کوڕی لە چەند وشەیەکی ماناگیردا کورت دەکاتەوەو ئێمەش لەم میانەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ئەم هاوەڵە بەرێزە لە ڕووی سیاسەتو ئیدارەوە چ کەسێکی بەهرەدارو بالادەست بووە!.[3]

٢ـ دواهەمین (وتار)ی معاویە (ڕەزای خوای لێ بێت)و تاوو تینی نەخۆشیەکەی مەرگی:

دواهەمین وتارێك (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) خوێندیەوە ئەمە بوو: ئەی خەڵکینە: من دارم لە بڕ بۆتەوەو دەمرم، تا ئێستا سەرپەرشتیم کردن، چۆن ئەوانەی لە پێش مندا سەرپەرشتیان کردن لە من باشتر بوون، ئەوا هەر کەسێکیش بە دوای مندا سەرپەرشتیتان بکات لە من خراپتر دەبێت، ئەی یەزید: کە ئەجەلم هات، شۆرینم بە کەسێکی ئاقڵمەند بسپێرە، چونکە ئاقڵمەند بە لای خوداوە پایەدارە، با پاكو تەمیز بمشواتو بە دەنگ (الله أكبر) بکات، ئەمجا بچۆ خەزێنە، سرنج بدە! بوخچەیەکی لێیەو، (پارچە پۆشاکێكو چەند تاڵە موویەكو چەند دەنکە نینۆکێك)ی پێغەمبەری خودا (ﷺ)ی تێدایە، تاڵە مووو دەنکە نینۆکەکانم بکەرە نێو لوتو گوێو چاومەوە، پۆشاکەکە لە ژێر کفنەکەمەوە لە جەستەم

---

١ نهاية الأرب (٦/٤٤)، العقد الفريد (١/٢٥).

٢ نهاية الأرب (١/٢٥٦).

٣ مرويات خلافة معاوية في تأريخ الطبري (ص: ٩٥).

شەتەك بدە، ئەی (یەزید)! سەبارەت بە باوكو دایك ئاگات لە وەسێتی خودا بێت، جا كاتێك خستتانمە نێو كفنەكەمەوەو، لەنێو گۆڕەكەمتان دانام، (معاویە) بەجێ بێڵن‌و بە خودای هەرە بەڕەحمی بسپێرن.[1]

(معاویە) لە كاتی سەرە مەرگیدا دەیوت:

لعمري لقد عُمّرت في الدهر بُرهة ... ودانـــت لي الدنيا بوقع البواتر

وأعطيت حمر المال والحكم والنُّهى ... وسلم قماقيم الملوك الجبابر

فأضحى الذي قد كان مما يَسُرُّني ... كحلم مضى في المزمنات الغوابر

فياليتني لم أعن في الملك ساعة ... ولم أعن في لذات عيش نواضر

وكنت كذي طمرين عاش ببلغة ... من العيش حتى زار ضيق المقابر[2]

لە ژێر ڕۆشنایی بەرنامەكەی (عمری كوڕی خطاب)دا كە سامانی كاربەڕێوەبەرەكانی دابەش كردبوو ئەویش هەستاو بە خاتری ئاودانی دڵی خۆی‌و ئاسودەكردنی ویژدانی بڕیاریدا نیوەی سامانی شەخسی خۆی بۆ (بیت المال) بگێڕنەوە،[3] وتراوە: (معاویە) لە دوارۆژەكانی ژیانیدا زۆری سەرما دەبوو، ئەگەر پۆشاكی لەبەر دەكرد یان بە شتێكی ئەستوور دایاندەپۆشی خامۆش‌و خەمبار دەبوو، بۆیە بەرگێكیان لە پەڕو باڵی باڵندە بۆ دروست كردبوو، ئەمەشی لەبەر گران بوو، جا وتی: دەك بڕوخێی دنیا بۆ خۆت‌و ماڵێكت چل ساڵ تێتدا خاوەنداریم كردی، بیست ساڵ بە ئەمیرایەتی‌و بیستی تریش بە خەلیفایەتی، دوای هەمووی ئەمە حاڵ‌و سەرەنجامی منە لە تۆدا، دەك دنیا عەمرت نەمێنێ‌ـ عەمری ئەوانەش نەمێنێ خۆشیان دەوێی‌و دڵی خۆیانت پێ خۆش دەكەن.[4] كاتێك نەخۆشیەكە تینی بۆ هێنا، خەڵك لەنێو خۆیاندا وتیان ئەمە مەرگە، ئەو بە كەسوكاری خۆی وت چاوم بە كل بڕێژن، قژی سەرم بۆ چەور بكەن‌و بە شانەی بكەن، ئیتر وایان كردو دەموچاویان بە زەیت بریقاندەوە، جێگایان بۆ چاك كردو دانیشت‌و وتی: پشتم بە دیوارەوە بدەن، ئەمجا وتی: ڕێ بە خەڵك بدەن‌و كەس ڕاگیر مەكەن، با بێنە ژوورەوە و هەر بە پێوە سەلامم لێ بكەن‌و بڕۆن، ئیدی خەڵك بەسەرە دەچوونە لای و بە پێوە سەلامیان لێ دەكردو دەیانبینی: چاوی بە كل ڕژاوەو قژی بە زەیت داهێنراوە، دەیانگوت: دەڵێن ئەجەلی هاتووەو خەریكە دەمرێ، بە خوا

١ البداية والنهاية (١١/ ٤٥٤).
٢ البداية والنهاية (١١/ ٤٥٥).
٣ البداية والنهاية (١١/ ٤٥٥).
٤ البداية والنهاية (١١/ ٤٥٥).

ئەلەمی لێ نیەو لە هەموو کەس ساغترە!.[١] جا کاتێك دەچوونە دەرەوە، (معاویە) نموونەی بە وتەکانی (أبو ذؤيب الهذلي)ی شاعیر دەهێنایەوەو دەیوت:

وتَجَلُّدي للشَّامِتِــينَ أُرِيهُمُ　　أنّي لرَيْبِ الدَّهْرِ لا أتَضَعْضَعُ
وإذا المَنيَّةُ أنْشَبَتْ أظْفارَها　　ألْفَيْتَ كُــلَّ تَميمَــةٍ لا تَنْفَعُ

کار بەوە گەیشت لاکەلەکەی کون ببوو و کێمو هەوای دەردەکردو، هەر لەو ڕۆژەدا کۆچی دوایی کرد،[٢] کاتێك مەرگ بوو بە میوانی دەیوت: خۆزگە هەر پیاوێکی قورەیشی بوومایەو بەسو لە (ذوطوی) بوومایەو تۆزقاڵێك لەم کاروبارەم بە دەست نەبووایەو[٣] بەم شیعرانە قسەی لەگەڵ خۆی دەکردو دەیوت:

إنْ تُناقِشْ يكنْ نِقاشُكَ ياربِ　　عذاباً، لا طوقَ لي بالعذابِ
أو تجاوزْ، فأنتَ ربٌّ رحيــمٌ　　عن مُسيءٍ ذُنوبُـهُ كالتّرابِ[٤]

ئەو لە کاتێکدا بە نەخۆشی -لە جێگاکەیدا- تلی دەخوارد و وەك لقەدار خورمای سوتێنراوی لێهاتبوو و خەڵکانی دەوروبەری هەڵیاندەسوڕاند ،دەیوت: ئەوە چ پیرێك بەملاوبەولادا وەردەگێڕن؟ ئەگەر سبەینێ خودا لە سزای ئاگری نەپارێزێت.[٥]

(حەسەنی بەصری) دەڵێت: (معاویە) لە گیانەڵادا بوو، خەڵك دەچوونە لای، ((معاویە) گریا، پێی وترا: چ شتێك دەتگریەنێ؟ وتی: نە لەبەر مەرگ دەگریەم کە هەنگاوی بەرەو دەنێم، نە بۆ دونیا دەگریەم کە بەجێی دێڵم، بەڵام دەزانم کە تەنها دوو چنگە: چنگێك بۆ بەهەشتەو چنگێك بۆ دۆزەخ، نازانم لە کام چنگەیاندام![٦]

لە کاتی گیانەڵادا بێ هۆش کەوتو پاشان بە ئاگا هاتەوەو بە کەسوکارەکەی خۆی وت: پارێز لە خودا بکەن، چونکە خودا کەسێك دەپارێزێت کە پارێزی لە ئەو کردبێتو کەسێك ناپارێزێت پارێز لە ئەو نەکات.[٧] لا ڕوومەتێکی دەخستە سەر خاكو ئەمجا لاکەی تری هەڵدەسوڕاندو دەیخستە سەر خاكو دەگریاو دەیوت: خودایە! تۆ بۆ خۆت لە کتێبەکەتدا

---

١ البداية والنهاية (١١/ ٤٥٦).
٢ البداية والنهاية (١١/ ٤٥٦).
٣ البداية والنهاية (١١/ ٤٥٦).
٤ البداية والنهاية (١١/ ٤٥٦).
٥ البداية والنهاية (١١/ ٤٥٧).
٦ كتاب المحتضرين (ص: ١٩٩)، سكب العبرات (١/١٩٠).
٧ تأريخ الطبري (٦/٢٤٥).

فەرمووتـە: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴾[١] واتـە: خـودا خـۆش نابێت شەریکی بۆ بەرقەرار بدرێت بێ لە (شیرك) لە هەموو تاوانێکی تر خۆش دەبێ بۆ هـەر کەسێك خودی خـودا ویستی لەسـەر بێـت. دەسا خودایـە! بمخەیتـە ڕیـزی ئـەو کەسـانەی ویـستت لەسـەرە لێیـان خـۆش بـی.[٢] هـەر لـەو ڕۆژەدا بـەم شـێوەیە پاڕایـەوە: خودایـە لـە چۆرتمەکانم کەم کەوە، لە لادانەکانم ببوورە، بـە نـەرمونیانی خـۆت لـە هەڵـەو نەفامیـەکانی کەسێك خۆش ببە کە جگە لە زاتی تۆ هومێدی بە هیچ کەس‌و شتێکی تر نیە، تـۆ لێبووردنـت بەرفراوانە، گوناهبار کە مرد لە ترسی گوناهەکانی هیچ پەنایەك شك نابات جگە لە پەنای تـۆ نەبێت.[٣] لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: خودایە! حەزم لێیە بە خزمەتت بگەم، جا گەیشتن بـە منت پێ خۆش بێت.[٤] دەسا خـودا بـە سـۆزو بـەزەیی‌و ڕەزای خـۆت پێـشوازی لـە (معاویـە) بکەی.

٣ـ ساڵی کۆچی دوایی (معاویە)و (کێ)ش نوێژی لەسەر کرد:

(الطبري) دەڵێت: لەم ساڵەدا (٦٠ك) (معاویە) لە دیمەشق کۆچی دوایی کـرد، دوای ئـەوە کە هەموو (مێژوونووسان) یەکدەنگن لەسەر ئەوە کە لە مانگی ڕەجەبی سـاڵی ٦٠ی کۆچـیدا کۆچی دوایی کردووە، بەڵام لەسەر کاتی کۆچەکەی ڕایان جیاوازە.[٥]

(إبن حجر) دەڵێ: بەپێی ڕیوایەتی ڕاسـت‌و دروسـت (صـحیح) لـە ڕەجـەبی ٦٠ی کۆچـیدا مردووە،[٦] کە (معاویە) مرد، (یەزید) لە سەفەر بوو، بۆیـە (زوحـاکی کـوڕی قەیـسی فـەهری) نوێـژی لەسـەر کـرد،[٧] لـەو دەمـەدا (معاویـە) فەقیانـەی کفنەکـەی بەسـەر دەسـتیدا شـۆڕ ببوونەوە، (زوحاك) چووە سەر (مینبەر)و سـوپاس‌و ستایـشی خـودای کـردو، ئـەمجا وتـی: (معاویە) کەڵەپیاوی ئەزموندیدەو شاسواری ڕچەشکێنی عەرەب بوو، خودا بە هـۆی ئـەوەوە فیتنەو ئاشوبی بنبڕ کردو کردی بە سـەرۆکی بەنـدەکانی‌و چـەندین وڵاتـی پـێ فـەتح کـرد، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو مردو ئەمە کفنەکەیەتی‌و تەرمەکەی پێ شەتەك دەدەین‌و دەیخەینە نێو

---

١ النساء (٤٨).
٢ البداية والنهاية (١١/ ٤٥٧).
٣ البداية والنهاية (١١/ ٤٥٧).
٤ تأريخ إبن خلدون (٣/٢١).
٥ تأريخ الطبري (٦/٢٤١).
٦ الأصابة (٦/١٥٥).
٧ تأريخ الطبري (٦/٢٤٦).

گۆڕەکەیەوەو، بە خۆی‌و کردەوەکانیەوە بەجێی دێڵین، ئەمجا لەوێوە تا قیامەت دەچێتە نێو (بەرزەخ)ەوە، جا کێ لە ئێوە دەیەوێ ئامادەی ڕێ‌و ڕەسمی نوێژ لەسەرکردن‌و ناشتنی بێ با لە کاتی یەکەم –واتە نوێژی نیوەڕۆ– لێرە حازر بێت. هەواڵی نەخۆشی‌و ئێش‌و ژواری (معاویە) بە پۆستەچیدا بۆ (یەزید) نێردرا، لێرەدا مێژوونووسان ڕای جیاوازیان هەیە کە ئایا (یەزید) لە کاتی مەرگی باوکیدا ئامادەبووە یان نا؟ ڕای ڕاست‌و دروست ئەمەیە کە ئەو بە زیندوویی بەسەر بابی ڕانەگەیشتووە، بەڵکو دوای مەرگی گەیشتۆتەوە دیمەشق،[1] کاتێك هەواڵ بە (یەزید) گەیشت وتی:

جـــاء البريد بقرطـــاس يخب به — فـأوجس القلب من قرطاسه فرعاً
قلنـــا لك الويل مـــاذا في كتابكم؟ — قـــالوا: الخليفة أمس مثبتاً وجعاً
فمادت الأرض أو كـادت تميد بنا — كـــأن أغبر مـــن أركانها إنقطعاً
من لا تزال نفسه توفي على شرف — توشك مقاليد تلك النفس أن تقعاً
لما إنتهينا وبـــاب الـدار منصفق — وصوت رملة[2] ريع القلب فانصدعاً[3]

٤ـ تەمەنی (معاویە) (ڕەزای خوای لێ بێت) لە کاتی مەرگیدا:

دەڵێین: ڕای ڕاست‌و دروست‌و پەسەند ئەمەیە کە: معاویە لە تەمەنی (٧٨) حەفتاو هەشت ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە،[4] بەڵگەمان وتەی (إبن حجر)ە کە دەڵێت: مەشهورە کە پێنج ساڵ بەر لە بیعسەت –واتە ڕەوانەکرانی پێغەمبەری خودا (ﷺ)– لە دیك بووە،[5] هەروەك زانراویشە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بە سیانزە ساڵ بەر لە هیجرەت (کۆچکردنی بۆ مەدینە) ڕەوانە کراوە، بەم جۆرە: دەبێ هەژدە ساڵ بەر لە هیجرەت لە دایك بووبێت‌و لە کاتێکیشدا کە لە ساڵی ٦٠ی کۆچیدا وەفاتی کردبێت، ئەوا دەگەینە ئەم ئەنجامە: کە تەمەنی لە کاتی مەرگیدا حەفتاو هەشت (٧٨) ساڵ بووە.[6]

---

١ تأريخ الطبري (٦/٢٤٦).
٢ (ڕەملە)ی کچی معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان، هاوسەری عەمروی کوڕی عوسمانی کوڕی عەفان.
٣ تأريخ الطبري (٦/٢٤٦).
٤ تأريخ الطبري (٦/٢٤٣).
٥ الاصابة (٦/١٥١).
٦ تأريخ الطبري (٦/٢٤٣).

**٥ـ ماوەی خیلافەتی:**

(حەسەنی کوڕی عەلی) لە (نەخیلە) تەنازولی بۆ (معاویە) کردو لە مانگی ڕەبیعی یەکەمی ٤١ك بەیعەتی خیلافەت درا بە (معاویە)و، لە ڕۆژی پێنج شەممە ٢٢ی ڕەجەبی ٦٠ی‌ك، لە دیمەشق کۆچی دوایی کرد، بەم چەشنە دەردەکەوێت کە ماوەی (١٩) ساڵو (٣) مانگو (٢٧) ڕۆژ پۆستی خیلافەتی بە دەستەوە بووە.[1]

**٦ـ لە شینیدا بەم چەشنە لاوێنراوەتەوە:**

(ابو الورد العنبري) لە شینی معاویە (ڕەزای خوای لێ بێت)دا وتوویەتی:

ألا أنعي معاوية بن حرب ... نعاه الحل للشهر الحرام
نعاه الناعجات بكل فج ... خواضع في الأزمّة كالسهام
فهاتيك النجوم وهنَّ خُرسٌ ... ينخن على معاوية الشام

(أمان بن خزيم)یش بەم جۆرەی لاواندۆتەوە:

رمى الحدثان نسوة آل حرب ... بمقدار سمدن له سموداً
فردَّ شعورهن السّود بيضاً ... ورد وجوههن البيض سوداً
فإنك لوشهدت بكاء هند ... ورملة إذ يصفقن الخدوداً
بكيت بكاء معولة قريح ... أصاب الدهر واحدها الفريداً[2]

**٧ـ وتەی (عبدالله ی کوڕی عباس) سەبارەت بە مردنی (معاویە) (خوا لە هەموویان ڕازی بێت):**

(عامری کوڕی مەسعودی جوهەنی) وتی: ئێمە لە مزگەوت بووین هەواڵی مەرگی (معاویە) گەیشت، بۆ لای (عبدالله ی کوڕی عباس) چووین، دەبینین چەند کەسێکی لە لا دانیشتوون‌و سفرەیان لەبەردەم ڕاخراوە، بەڵام خواردنی لەسەر دانەنرابوو، وتمان ئەی (ئیبنو عەباس): ئەم هەواڵەت پێ نەگەیشتووە؟ وتی: کام هەواڵە؟ وتمان: (معاویە) مرد، وتی: ها بچکۆل سفرەکەت هەڵگرەوە، ماوەیەك واقی ورماو کشومات سەری داخست، ئەمجا بە دەنگ هات‌و وتی: چیایەك لەرزی‌و ئەمجا ڕاقەناو بە خڕی کەوتە نێو دەریاوە،[3] قازی (أبو يعلى) دوای

---

١ تأريخ الطبري (٦/٢٤٣).

٢ البداية والنهاية (١١/٤٦٢).

٣ تنزيه خال المؤمنين معاوية بن أبي سفيان (ص: ١١٣).

گێڕانــەوەی ئــەم بەســەرهاتە، وتــی: خودایــە باوەشــت زۆر فراوانــەو (معاویــە) بخەیتــە نێــو باوەشی بەزەیی خۆتەوەو بە چاکترین شێواز لە ئەویش‌و لە ئێمەش ببووره.[١]

**٨ـ نەخشی ئەنگوستیلەکەی:**

بریتی بوو لە: (لكل عمل ثواب)[٢] واتە: هەر کردەوەیەك پاداشتی خۆی هەیە، بــە گــوێرەی ڕیوایەتێکی لاواز وتراوە: کە نەخشی ئەنگوستیلەکەی بریتی بووە لە (لا إله إلاّ الله).[٣]

**٩ـ بە موتفەڕکدانانی شوێنەوارەکانی پێغەمبەری خودا (ﷺ):**

(عبــدالأعلیی کــوڕی مــەیمون) لــە باوکیــەوە دەگێڕێتــەوە: (معاویــە) لــە کــاتی نەخۆشــی سەرەمەرگیدا وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) کراسێکی لەبەر کردم، منیش هــەڵمگرت، ڕۆژێــك نینۆکی کرد، منیش دەنکە نینۆکەکانیم خستە نێو قوتویەکەوەو هەڵمگرت، هــەرکات مــردم، ئــەو کراســەم لەبــەر بکــەن‌و نینۆکــەکانیش بهــاڕن‌و بیخەنــە نێــو زارو چــاومەوە، بــەڵکو بــە بەرەکەتی ئەمەوە خودا بەزەیی پێمدا بێتەوە.[٤]

بە موتفەڕکدانانی شوێنەوارە هەستی‌و بەردەستیەکانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە لایــەن هاوەڵانەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) یەکێکــە لــە جۆرەکــانی موتفــەڕکی (مەشــروع)و بــە ڕەوا دانراو، بە جۆرێك هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێ بێت) لە میانەی ژیانی پێغەمبەری خودا (ﷺ)و دوای مەرگیــشی ئەمــەیان کــردووە،[٥] هــەروەها پێــشینە چــاك‌و پاکەکانیــشمان (ڕەحمــەتی خوایان لێ بێت) ئەمەیان کردووە، بەڵگە بۆ ئەمە:

أـــ (جابری کوڕی عبدالله) (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: من نەخۆش‌و بێهۆش‌و گۆش بووم، پێغەمبەری خودا (ﷺ) سەردانی کردم، ئاوی دەستنوێژی خۆی بەسەردا ڕشاندم‌و بە هــۆش هاتمەوە.[٦]

ب ـــ (عثمــانی کــوڕی عبــدالله ی کــوڕی وهــب) وتــی: ماڵــەوەمان پــەرداخێکی ئــاو خواردنەوەیان پێدا ناردم بۆ لای (أم مسلمه) ئەویش قاپیلکە زیوێکی زەنگوڵە ئاسای هێنــاو داوە مووی پێغەمبەری خودا (ﷺ)ی تێدا بوو، هــەر کــات کەســێك چاوەزار لێــی دەدا یــان

---

١ المصدر نفسه (ص: ١١٣).

٢ تأريخ القضاعي (ص: ٣٤٦).

٣ المصدر نفسه (ص: ٣٤٦).

٤ تأريخ الطبري (٦/٢٤٥).

٥ مرويات خلافة معاوية في تأريخ الطبري (ص: ٩٣).

٦ صحيح البخاري مع فتح الباري (١٠/٣٦٠).

تووشی نەخۆشیەك دەبوو (مِخضبة) واتە قاپێکی بۆ لا دەنارد.[١] (إبن حجر) دەڵێ: (مخضبة) جۆرە هەورێکە، مەبەست ئەوەیە: هەر کەسێك ئێشو ئازارێکی توش بووبایە جامێکی بۆ لای (أم مسلمە) دەنارد، ئەویش ئاوی تێدەکردو مووەکانی تێهەڵدەکێشانو بە ئاوەوە بۆی دەناردەوە، خاوەن پەرداخ بە نێتو نیازی شیفا لێی دەخواردەوە یان دوای ئەوە خۆی پێ دەشۆرد، ئیتر بە نیازەکەی دەگەیشت.[٢]

ج ـ (ئەسمائەی کچی ئەبوبکر) (ڕەزای خوای لێ بێت) سەبارەت بە جوبەکەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) وتی: ئەمە لە لای (عائیشە) مایەوە، هەتا ئەو ڕۆژەی کۆچی دوایی کرد، ئیتر دوای ئەو هەڵمگرت، پێغەمبەری خودا (ﷺ) لەبەری دەکرد، ئێمەش کەسێك نەخۆش دەبوو بۆمان لەئاو هەڵدەکێشاو بە نێتی شیفا ئاوەکەی بەکاردەهێنا.[٣]

لێرەدا زانایان لەسەر بنەمای بابەتی بە موتفەڕکدانانی شوێنەوارو شتە جێماوەکانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) لقێکیان لەسەر بە موتفەڕکحیسابکردنی زیادەو شوێنەواری صاڵحان دەرکێشاوەو سەبارەت بەم ڕیوایەتەی (عورووەی کوری مسعود) کە وەسفی هاوەڵانی دەوروبەری پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەکاتو دەڵێت: وەڵڵاهی هەر جارێك پێغەمبەری خودا (ﷺ) تفی ڕۆکردبایە، هاوەڵان نەیاندەهێشت بکەوێتە سەر زەوی، بەڵکو دەکەوتە نێو لەپەدەستی یەکێکیانەوەو لە دەموچاوو لاشەی هەڵدەسوو، خەریك بوو لەسەر ئاوی دەستنوێژی شەڕیان دەکرد،[٤] (الشاطبي) لەسەر ئەم فەرموودەو فەرموودە هاوچەشنەکانی قسە دەکاتو دەڵێت: بە گوێرەی ڕواڵەتی ئەم فەرموودانە هەر کەسێك سەلماندبێتی کە دۆستی خودایەو شوێنکەوتووی پێغەمبەری خودایە (ﷺ) دروستە ئاوی دەستنوێژی بە موتفەڕك بەکاربهێنرێتو، تفی زاری لە بەدەن هەڵسوێنرێتو، بەهۆی هەموو شوێنەوارەکانو شتە بەجێماوەکانیەوە داوای شیفا بکرێت، بەڵام لێرەدا بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگر لە بەرانبەر ئەم بۆچوونەماندا ڕاست دەبێتەوەو پێمان دەڵێ کە: دوای وەفاتی پێغەمبەری خودا (ﷺ)

---

١ المصدر نفسه (١٠/٣٦٤).
٢ فتح الباري (١٠/٣٦٥).
٣ صحيح مسلم بشرح النووي (١٤/٣٤).
٤ زاد المعاد (٣:٢٩٠)، السيرة النبوية في ضوء المصادر الأصلية (ص: ٨٨).

هیچ جۆرە هەڵوێست‌و ڕەفتارێکی لەم چەشنە لە لایەن هاوەڵانەوە لە بەرانبەر ئەو کەسە ئەنجام نەدراوە کە ببووە جێنشینی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەمە لە حاڵێکدا کە دەزانین پێغەمبەری خودا (ﷺ) کەسێکی لە دوای خۆیەوە بەجێ نەهێشتبوو لە (أبوبکری صدیق) (ڕەزای خوای لێ بێت) چاکتر بێت، ئەم ڕەفتارە نە لە بەرانبەر (أبوبکر)ی خەلیفەی‌و نە (عمر)ێك (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەنجام نەدراوە کە دوای (أبوبکر) بە پایەدارترین کەسی نێو ئوممەت دێتە هەژمار، بە هەمان جۆر هەمان هەڵوێست لە بەرانبەر (عثمان)و (علی)و یەك کەس لە تەواوی هاوەڵان ئەنجام نەدراوە، کە شتێکی حاشا هەڵنەگرە یەك کەس لە ئوممەتدا لە چاکی‌و پایەبەرزیدا توانای نیە شان لە شانی ئەوان بدات، لە لایەکی ترەوە لە هیچ ڕێگایەکی ڕاست‌و دروستەوە نەچەسپاوە کە هیچ کامێك لەوان نە خۆی نە کەلوپەلی حیسابی موتەفەڕکی بۆ کرابێ، یان بۆ خۆیان لەنێو خۆیاندا خۆیان‌و شتی خۆیان بە موتەفەڕك دانابێت، بەڵکو تەنهاو تەنها پابەند بوون بەو گوفتارو ڕەفتارو کردارانەی لە سەردەمی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەنجامیان دابوون‌و هەنگاو بە هەنگاو شوێنپێی پێغەمبەری خودایان (ﷺ) هەڵدەگرت، کەواتە ئەنجامنەدانی ئەم ڕەفتارانەو وازهێنان لەم چەشنە شتانە لە لایەن هاوەڵانەوە کۆڕا (ئیجماع)ی لەسەر کراوە.[١]

---

١ غزوة الحديبية للحكمي (ص: ٣٠٥).

# فەسڵی پێنجەم

## سەردەمی ( یەزیدی کوڕی معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان )

## باسی یەکەم : ناو و نازناو و بنەچەکە و پەروەردەبوونی و ژیان و وەرگرتنی پۆستی خیلافەت:

### یەکەم: ناوو نازناوو بنەچەکە:

ناو: (یەزیدی کوڕی معاویەی کوڕی أبی سفیانی کوڕی صخری کوڕی حرب ی کوڕی أمیەی کوڕی عبدشمس ی قورەیشی) . نازناو: (أبو خالد)[١]. نەنکی – دایکی باوکی–: (هندی کچی عتبەی کوڕی ربیعة)بوو، ڕۆژی فەتح– ی مەککە– موسڵمان بوو، لە ریزی ژنە زیرەکەکانی سەردەمی خۆی بوو، ژیر وهەستیار و بەدەمار بوو[٢]. دایکی: (میسون ی کچی بحدل ی کلبی بوو، یەکێك بووله ڕستەی ژنەشاعیرانی عەرەبی سەردەمی خۆی، ژنێکی ئاقڵ بووو باوکیشی یەکێك بوو لە پیاوماقوڵانی هۆزی کلب[٣].

### دووەم: لە دایکبوون و پێگەیشتنی:

.... لە دایکبونی (یەزیدی کوڕی معاویە) لە سەردەمی خیلافەتی (عثمان)خوای لێی ڕازبێت[٤]داو، لە ساڵی ٢٦ی‌ك یدا بووە[٥]. گوتراوە: لە دایکبونی ئەوو لە دایکبونی (عبدالملك ی کوڕی مروان) لە یەك ساڵدا بووە کە دەکاتە ٢٦ی ك[٦]. کە باوکی دایکی تەڵاقدا ئەو مندالْ بووە. بۆیە لەگەڵ دایکیو خاڵەکانی – کەسەرانی هۆزی کەلب بوون– دەژیا، دایکی لە دەشتو دەر پەروەردەی کردو، بەرەبەرە لەسەر سروشتی ئەم پەروەردە ڕاهاتو، کەسایەتیەکی قسە ڕەوانو وتار بێژو بەخشندەو ئازای لێ دروست بوو[٧]. هێندە بە دەشتو بیابانەوە پابەندبووەو زۆر گوێی بە خۆیو ژیانی نەدەدا، دوای ئەوە باوکی کۆچی دوایی کردو ئەویش لە نێو خاڵەکانیڕا بەرەو (دیمەشق) هاتەوە،خەڵکی (شام) تەماشایان کرد. ئەم پیاوە نە مێزەری بەسەرەوەیەو نەشمشێری بەشانەوەیەو، وتیان: ئائەم کابرا دەشتەکیە

---

١ الاستیعاب (١٤١٦/٣)، تأریخ خلیفة (ص: ١٠).

٢ الطبقات (١٧٠/٨)، التبیین في أنساب القریشیین (ص: ٢١٨).

٣ موقف المعارضة (ص: ٤٠)، نسب قریش (ص: ١٢٧).

٤ تهذیب التهذیب (٣١٦/١١، ٣١٧).

٥ فوات الوفیات (٣٢٨/٤).

٦ تأریخ أبو زرعة (١٩١/١)، مواقف المعارضة (ص: ٣٩).

٧ مواقف العمارضة (ص: ٤٣)، مأثر الأناقة (١١٥/١، ١١٦).

کاروباری ئەم ئوممەتەی پێ سپێردراوە؟[١]. باوکی بایەخی تەواوی پێ دابوو مامۆستایەکی تایبەتی بەناوی(دغفل ی کوڕی حنظلة ی سروسی شەیبانی)بۆ تەرخان کردبوو[٢]. (معاویە) وایدەکرد– یەزید ی کوڕی ئامادەی مەجلیسەکانی ببێ ، ئیدی لە میانەی ئەمەدا سودی لە سیاسەتو بەڕێوەبەرایە تیکردنەکەی باوکی وەردەگرت[٣]. لەلایەکی ترەوە(یەزید) بەهرەی زۆری لە زانیاریەکانی (عبیدی کوڕی شریەی جهرمي) وەرگرت، (عبید) کە خەڵکی (صنعا)ی یەمەن بوو، لەسەر داوای (معاویە) هاتبوە (دیمەشق)، شارەزای مێژوو ڕوداوەکانی عەرەب بوو، خاوەنی (كتاب الأمثال)و (كتاب الملوك)و هەواڵی پێشینان بوو[٤]. (یەزید) لەلایەن ئەم حەکیمەوە کە بەهۆی ئەزموونو تەمەن پەندی زۆری وەرگرتبوو تەواو کاری لەسەرکرابوو، (عبیدی کوڕی شریە) لەساڵی ٧٠ك کۆچی دوایی کرد[٥]. (یەزید)یش لێیەوە فێرببوو بەچەشنی شارەزا قسەی لەسەر ڕەچەڵەکەکان دەکرد[٦]. (الذهبي) سەبارەت بەژیانو ڕەچەڵەکی (عبدالصمدی کوڕی علی الهاشمیی) دەڵێ: (یزید)ی خەلیفە یەکێك بوو لە ڕەچەڵەکناسانی سەردەمی خۆی[٧]. ئیتر ئەوەی بۆ (یزید) ڕەخسابوو بۆ کەسی تر نەڕەخسابوو، زیاد لەمەش کەباوکی یەکێك بوو لە ڕیزی هاوەڵە مەزنەکان خوا لێی ڕازی بێتو کاتبی پێغەمبەری خودا (ﷺ)بوو، (یەزید) چەند فەرموودەیەکی لە باوکیەوە ڕیوایەت کردون، وەك فەرموودەی: (من يرداالله به خيراً يفقهه في الدين)[٨].واتەهەرکەسێك خودا بیەوێ چاکەیەکی باشی پێ ڕەوابببینێ شارەزای دەکا لە (دین)دا، (أبو زرعەی دیمەشقی)ی لە چینی دوای هاوەڵاندا ناوی هێناوەو وتویەتی: کە چەند فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە[٩]. (معاویە) خوا لێی ڕازی بێت هەمیشە هەوڵی دەدا(یزید) سود لەو مەجلیسانە وەربگرێ کە بۆ میوانەکانی ڕێك دەخران، (إبن المبارك) دەڵێ: (معاویە) ڕوی لە یەکێك لە میوانەکانی کردو وتی: لە نێو عەشیرەتی ئێوە چ شتێك بەنیشانەی پیاوەتی (جوامێری) دادەنرێ؟ وتیان:

---

١ سير أعلام النبلاء (٣٦/٤، ٣٧).

٢ المعجم الكبير (٢٢٦/٤)، مواقف المعارضة (ص: ٤٣).

٣ مواقف المعارضة في خلافة يزيد (ص: ٤٣).

٤ الحياة العلمية في الشام في القرن الأولى والثاني (ص: ١٩٧)، مواقف المعارضة (ص: ٤٥).

٥ إرشاد الأريب (٧٠/١٢، ٧٨)، مواقف المعارضة (ص: ٤٤).

٦ أنساب الأشراف (٢٩٥/٤، ٢٩٦).

٧ سير أعلام النبلاء (١٣٠/٩).

٨ صحيح مسلم (٧١٨/٢)، رقم: ١٠٣٧).

٩ البداية والنهاية (١١/ ٦٣٨).

(پاکیزەیی لە دینداو، چاکسازی لەگوزەراندا) جا (معاویە) وتی: ئەی (یەزید) گوێ بگرە[1].
هەر کە (معاویە) بەتەواوەتی دەستی لە کاروبارو حوکمڕانی (شام) گیربوو، بایەخی زۆری بە پەروەردەکردنی کوڕەکەیدا، لەسەرەتاوە بەشداری (هاوینە هێرشەکان)ی‌و پێکردو فێری هەڵگرتنی باری بەرپرسیاریەتی کرد[2]. هەروەها بەمەبەستی وەرگرتنی زانیاری لەسەر ئاستی پێشکەوتنی (یەزید) هەمیشە پەیوەندی بە (مامۆستا) کەیەوە دەکردو، بە هەمان جۆر لە (یەزید)ی دەپرسی کەپەیوەندی لەگەڵ مامۆستاکەیدا چۆنە، بەگوێرەی یەکێك لە ریوایەتەکان: ڕۆژێك (معاویە) ڕووی لە (یزید) کردو پرسی: ها (یزید)، مامۆستاکەت لێت دەدا؟ وتی: نا ئەی ئەمیری ئیمانداران، وتی: بۆ؟، وتی: چونکە لە دادپەروەریدا ڕێو شوێنی ئەمیری ئیماندارانی گرتۆتە بەر[3]. جگە لەمە، ریوایەتگەلێك لەسەر وتو وێژی ڕۆشنبیریانەی نێوان (معاویەو یەزید) مان دێنە بەر چاو، ئا لێرەدا دەبینی (یزید) بچکۆلەیە بەڵام ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە (معاویە) چەندەی بایەخ بەکۆرەکەی خۆی داوە!، (إبن ظفر الصقلي) دەگێڕێتەوە: (معاویەی کوڕی ئەبی سفیان) بە (یەزید)ی کوڕی حەوت ساڵانەی گوت: ڕۆڵە گیان لە کام سورەتەدای؟ – لە سورەتی (القتال) دابووو حەزی لێ نەبوو بیڵێ – بۆیە وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران من لەو سورەتەدام کە بە ئەم سورەتە دەگات: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴿١﴾ لِّيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٢﴾ وَيَنصُرَكَ اللَّهُ نَصْرًا عَزِيزًا ﴿٣﴾﴾[4] (معاویە) وتی: ئەم سورەتە کەوتۆتە نێوان دوو سورەتەوە، تۆ لەکام لایاندای؟ وتی: لەو سورەتەدام کە ئەم ئایەتەی تێدایە ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَآمَنُوا بِمَا نُزِّلَ عَلَىٰ مُحَمَّدٍ وَهُوَ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ كَفَّرَ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَأَصْلَحَ بَالَهُمْ ﴿٢﴾﴾[5]
لێرەدا (معاویە) وێنەی بەم کۆپلە شیعرە هێنایەوە:

ملوك وأبناء الملوك وسادة ... تفلق عنهم بيضة الطائر الصقر
متى تلقَ منهم ناشئاً في شبابه ... تجده على أعراق والده يجري
فهم يغزون الذنب ينقم مثله ... وهم تركوا وأي السفاهة والهجر[6].

---

١ تأريخ (دمشق)، نقلا عن مواقف المعارضة (ص: ٤٥).
٢ تأريخ الدولة العربية، سهيل زكار (ص: ٤٥).
٣ أنباء النجباء الأبناء (ص: ٦٩)، يزيد بن معاوية، حياته وعصره للعقيلي (ص: ١٢).
٤ الفتح (١ـ٣).
٥ محمد (٢).
٦ أنباء النجباء الأبناء (ص: ١٣)، يزيد بن معاوية، حياته وعصره للعقيلي (ص: ١٣).

بەردەوام ئامۆژگاری دەکردو بەرچاوی ڕوون دەکردەوەو هەڵی دەنا ڕای ئامانجپێك هەڵبژێری، ڕۆژێك دەیبینێ لە خزمەتکارێکی خۆی دەدا، پێی دەڵێ: ئەمە بەخراپ دەشکێتەوە بەسەرتدا، چۆن لە کەسێك دەدەی ناتوانێ بەرگری لە خۆی بکات و لە دژت بوەستێتەوە؟ وەڵڵاهی دەسەڵاتم ڕێی لێگرتوم تۆڵە لە ناحەزو داخدارانم بسێنمەوە، باشترین شت بۆ خاوەندەسەڵات ئەوەیە لە- ژێردەستەکانی- ببورێ[1]. لە فەرمودەی (صحیح)دا هاتوو: پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەبینێ (أبو مسعود) لە خزمەتکارێکی خۆی دەدا، پێی فەرموی: (إعلم أبا مسعود: ألله أقدر عليك منك عليه)[2]. واتە ئەی ئەبا مسعود بزانە: دەسەڵاتی خودا بەسەر تۆوە لە دەسەڵاتی تۆ بەسەر ئەوەوە زیاترە. ڕۆژێك (معاویە) لە (یزید) توڕە دەبێت و دەنگی لێ وەردەگرێ، (أحنف ی کوڕی قیس) پێی دەڵێ: ئەی ئەمیری ئیمانداران: ڕۆڵەکانمان جگەرگۆشە و بڕبڕەی پشتمانن، ئێمەش بۆ ئەوان ئاسمانی سایەدارو زەوی ڕامکراوین، کە تووڕەبوون ڕازییان کەن، کە داوایان کرد پێیان بدەن، مەبە بەبار بەسەریانەوە، نەبادا لێت بێزار بن و مەرگت بە ئاوات بخوازن، (معاویە) وتی: ئەی (ئەبا بەحر) بەسوودترین قسەت بۆ خاتری خودا کرد، ئەی خزمەتکار! بۆلای (یەزید) بچۆ سەلامی منی پێ بگەیەنەو پێی بڵێ: ئەمیری ئیمانداران فەرمانیدا سەد هەزار درهەموو سەد پۆشاکی پێ بەخشی، وتی: لەلایەن ئەمیری ئیماندارانەوە؟ وتی: (أحنف)! جا (یزید) وتی: قەی ناکا دەیکەمە شەریکە بەش، ئیدی پەنجا هەزار درهەم و پەنجا پۆشاکی بۆ (أحنف) نارد[3]، (یەزید) زەینی ڕوون و خاترجەم و وەڵامبەدەست بوو، (العبتي) دەڵێ: (زیاد) بە سامانێکی زۆرو بوخچەیەکی پڕ لەزێرو جەواهێر هاتە خزمەت (معاویە)، (معاویە) زۆر دڵخۆش بوو، (زیاد) هەستاو چووە سەر (مینبەر): ئەمجا شانازی بە هەموو ئەو چالاکیانەی خۆیەوە کرد کە لە وڵاتی عێراقدا ئەنجامی داون کە چۆن توانیویەتی ئەو مەمەملەکەتەو خەڵکەکەی بۆ (معاویە) وادارو فەرمانبەردار بکا، جا (یەزید) هەستاو، وتی: ئەی(زیاد) ئەگەر کاری لەم

---

١ البداية والنهاية (٦٤١/١١).

٢ مسلم، رقم: (١٦٥٩).

٣ البداية والنهاية (٦٤١/١١).

جۆرە بۆ ئێمە بکەی ئەوا ئێمەش: لە نێو تیرەی (سەقیفەوە بەرەو نێو هۆزی (قوڕەیش)ت دێنین‌و، لە بنەچەکەی (إبن عبيد)ت لادەبەین‌و دەتخەینە سەر بنەچەکەی (حرب ی کوڕی ئومەییە).(معاویە) پێی گوت: دانیشە، دەك بابو دایکمت بەقوربان بن! بەڵێ: معاویە یەزیدی کوڕی بەچەشنێك پەروەردە دەکرد تا بتوانێ ئەرکە کۆمەڵایەتیەکان بەباشی ڕاپەڕێنێ‌و هەڵسوکەوتی گونجاو لەبەرانبەر کەسە دیارو بەرچاوەکان بنوێنێ، کاتێك (عبداللهی کوڕی عباس) سەردانی معاویەی کرد، (معاویە) فەرمانی بە یەزید کرد بچێتە خزمەتی‌و بە بۆنەی کۆچی دوایی حەسەنی کوڕی عەلی -ی ئامۆزای- سەرەخۆشی لێ بکا، جاکە چووە خزمەت(ئیبنو عەباس) زۆر بەگەرمی بەخێراتنی لێ کردو ڕێزی زۆری لێ گرتو لەبەر دەستیدا دانیشت، هەرچەندە (ئیبنو عەباس) هەوڵیدا لەباری سەرەوە داینیشێنێ. بەڵام- یەزید- قبوڵی نەکردو، وتی: من لە مەجلیسی پیرۆزبایی دا نەنیشتوم، بەڵکو لە مەجلیسی تازیە باریدا دانیشتووم، ئەمجا هاتە سەرباسی(حەسەن)و، وتی: خودا بەزەیی بە(ئەبا محمد)دا بێتەوە و بیخاتە نێو ڕەحمەتی بەرفراوانی خۆیەوە، خودا پاداشتی تۆش زۆرو زەوەند بکات‌و جوانترین سەبرو تەسەلاییت پێ بداتو، لەبەرانبەر ئەم موسیبەتەدا بە باشترین پاداشت‌و چاکترین پاشە ڕۆژ عەوێزەت بۆ بکاتەوە. جا کاتێك یەزید هەستاو ڕۆیشت، (ئیبنو عەباس) وتی: هەر کات نەوەکانی(حەرب) نەمان، ئاقڵمەندانی نێو خەڵکیش نامێنن، ئەمجا ئەم شیعرەی وت:

مغاض عن العوراء لا ينطقونها          وأهل وراثات الحلوم الأوائل[1].

(معاویە) ڕەزای خوای لێ بێت نێوە نێوە یەزیدی تاقی دەکردەوە، ڕۆژێك پرسیاری لێکرد: ئەگەر بوی بە (خەلیفە) چ دەکەی؟ وتی: خودا دەست بەتەمەنتەوە بگرێ، وتی: پێم بڵێ: وتی: بابە گیان بە خوا بەنیازم وەك (عمری کوڕی خطاب) بەڕێوەی بەرم، معاویە وتی: سبحانە الله. سبحان الله، بەخوا ڕۆڵە گیان زۆرم هەوڵدا بە پەیڕەوی عثمان- کە هەرەئاسانەکەیان بوو- بەڕێوەیان بەرم، بەڵام توانام بەئەویش نەشکا[2].

---

١ البداية والنهاية (١١/٦٤٢).

٢ البداية والنهاية (١١/٦٤٤).

## سێیەم: هاوسەرو ڕۆڵەکانی

یەزید پرۆسەی هاوسەرگیری لە گەڵ (ئوم هاشمی کچی ئەبی سوفیانی کوڕی عوتبەی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی عەبدشەمس) گرێدا، ئەم ڕۆڵانەی لە ئەو لێ کەوتنەوە:

١- معاویە: بە (أبو عبدالرحمن) بانگ دەکراو، بە (ابو لیلی) ش ناسرابوو، شاعیر سەبارەت بە ئەو دەڵێ:

إني أرى فتنة قد حان أولها          والملك بعد أبي ليلى لمن غلب[1].

٢- خالد: بە (أبو هاشم) بانگ دەکرا، خۆی بەکاری (کیمیا گەری)یەوە خەریك کرد.

٣- (أبو سفيان) .....ئیتر(ئوم هاشم)ی دایکی ئەم ڕۆڵانە دوای مردنی یەزید شوی بە (مروانی کوڕی حکم) کرد[2]. هەروەها (یەزید) پرۆسەی هاوسەرگیری لەگەڵ (ئوم کلسوم ی کچی عبدالله ی کوڕی عامر) ئەنجامداو، لە ئەمیش(عبدالله)ی بوو. کە بە(الأسوار)[3]ناسرا ، (عبدالله) تیراندازێکی پلە یەکی نێو عەرەبەکانی سەردەمی خۆی لێ دەرچوو، شاعیر سەبارەت بە ئەو دەڵێ:

زعم الناس أن خير قريش          كلهم حين يذكر الأسوار[4].

لە کەنیزەکە حەلاڵەکانیشی ڕۆڵە گەلێکی باشی لێ کەوتەوە،لە نێوانیاندا ئەمانە هەبوون: (عبدالله ی ئەسغەر، أبوبکر، عمر، عتبە، عبدالرحمن، حرب، ڕەبیع، محمد،[5]، ئێستا ژمارەیەك لە نەوەکانی(محمدی کوڕی یزید) لە ناوچەی (عسیر)ی نیوەدورگەی عەرەبی بونیان هەیە، وەك گوتراوە لەکاتی هاتنە سەر کاری عەباسیەکانو ڕاوەدونانی ئومەویەکاندا، یەکێك لە نەوەکانی(محمد) پەنا بۆ ئەم ناوچەیە دەباتو،پاش ماوەیەك دەتوانێ ئیمارەتێك لەو ناوچەیەدا دابمەزرێنێو هەتا سەردەمی نوێ درێژە بەم ئیمارەتە بدرێ، هەتا کاتی دەستبەسەرداگیرانی نیوەدورگەی عەرەبی لەلایەن بنەماڵەی(عبدالعزیز ال سعود) یەکێك لە بنەماڵەکانی سەر بەنەوەی(محمدی کوڕی یزید) بەناوی (أل عائض بن مرعي) حوکمڕانی زۆربەی ناوچەکەی کردووە[6].

---

١ تأريخ الطبري (٦/٤٣٤).

٢ تأريخ الطبري (٦/٤٣٤).

٣ الأُسوار= ئوسوار، ئیسوار) واتە: تیراندازی چاك، نیشانەشکێن.

٤ تأريخ الطبري (٦/٤٣٤)، البداية والنهاية (١١/٦٦١).

٥ تأريخ الطبري (٦/٤٣٤)، البداية والنهاية (١١/٦٦١).

٦ التأريخ الاسلامي، العهد الأموي، محمود (٤/١٢٧).

## چوارەم: گرینگترین کارو چالاکیەکانی( یەزید ) لەسەردەمی باوکیدا: ( غەزای قوستەنتینیە ) بوو:

گرنگی ئەم غەزایەو شکۆمەندی بەشداربوانی غەزاکە لە چوارچێوەی فەرمودەیەکی پیرۆزدا باسی لێوەکراوە، لە فەرمودەیەکی (صحیح) واتە:- ڕاستو دروست-دا کە (أنسی کوڕی مالك) دەگێڕێتەوە چەسپاوە، أنس خوای لێ ڕازی بێت دەڵێ: هەر کات پێغەمبەر(ﷺ) سەردانی - مزگەوتی- قوبای دەکرد لە ماڵی (ئوم حەرام ی کچی مەلحان)ی هاوسەری(عوبادەی کوڕی صامت) لای دەدا، ڕۆژێك لەوێ لایداو، ئەویش خواردنێکی پێشکەش کرد، جا پێغەمبەری خودا (ﷺ) خەوی لێ کەوت، ئەمجا لە خەوڕابوو و پێ دەکەنی،- ئوم حەرام- وتی: گوتم، چ شتێك بە پێکەنینت دێنێ ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرموی: (ناسٌ من أمتي عرضوا عليَّ غزاة في سبيل الله، يركبون ثبج هذا البحر ملوكاً على الأسرة - أوقال- مثل الملوك على الأسرة) واتە:- لە خەونمدا- خەڵکانێك لە غەزاکەرانی ئوممەتی خۆم نیشان دران، وەکو پاشای سەر تەخت سواری شەپۆلە کانی نێوەڕاستی ئەو دەریایە دەبوون . گوتم: لە خوا بپاڕێوە لە گەڵیان بم، جا پاڕایەوەو،ئەمجا سەری دانایەوەو لێی خەوتەوە، پاشان بەخەبەر هاتەوەو پێ دەکەنی، وتم: چ شتێك بەپێکەنینت دێنێ ئەی پێغەمبەری خودا؟ جا فەرموی: (ناس متى أمتي عرضوا علي غزاة في سبيل الله يركبون ثبج البحر ملوكاً على الأسرة. أو : مثل الملوك على الأسرة)واتە: -لە خەونمدا- خەڵکانێکم لە ئوممەتی خۆم پێشاندران، لە ڕێی خودا بۆ غەزا دەچون،- بەکەشتی- سواری نێو قەدی دەریا ببون، دەتگوت پاشای سەرتەختن، جا وتم: بۆم بپاڕێوە خوا لە گەڵ ئەوانم بخا، فەرموی: (أنت من ألأولين) واتە: تۆ لە گەڵ یەکەمینەکەیانی، ئیتر- ئومولحەڕام- لەزەمانی معاویەدا - لە گەڵ غەزاکەران سواری کەشتی بوو و- چووە نێو دەریاوە- لە کاتێکدا لە دەریا پەڕیەوە ولاخەکەی هەڵی داشتو کۆچی دوایی کرد[1]. بەپێی ڕیوایەتێکی تر (أول جيش من أمتي يغزون مدينة قيصر مغفور لهم) [2]. واتە: یەکەم سوپای ئوممەتم جەنگی شاری (قەیسەر) دەکەن لێبوردراون، (إبن كثير) سەبارەت بەم فەرمودەیە دەڵێ: ئەمەی یەکەمیان لە ساڵی ٢٧ك یدا بوو کاتێك(معاویە) داوای لە (عثمان) کرد ڕێی پێ

١ صحيح مسلم، مع شرح النووي (١٣/٥٨، ٥٩).
٢ فتح الباري (٦/١٢٠).

بدا جەنگی (قوبرۆص)بکا، (عثمان) ڕێگای پێدا، ئیتر موسڵمانان سواری کەشتی بوون و بە جەنگ فەتحیان کردو چوونە ناویەوە، (ئوم حەڕام) لەم جەنگەدا ئامادە بوو و پاشان کۆچی دوایی کرد، (معاویە) (فاختەی کچی قرظة)ی هاوسەری لە گەڵدا بوو، بەڵام جەنگی دووەم: لە ساڵی ٥٢ك‌و لە سەردەمی دەسەڵاتی خودی (معاویە) دابوو، ئیدی سوپایەکی بەسەرکردایەتی (یەزید)ی کوڕی بەرەو جەنگی (قوستەنتینیە) بەڕێکرد،لە نێو سوپاکەدا کۆمەڵێك لە گەورەهاوەڵانی وەك (أبو أیوبی ئەنصاری خالدی کوڕی زید خوا لێی ڕازی بێت) دەبینران، (أبو أیوب) لە ڕێگادا کۆچی دوایی کرد، لەکاتی سەرە مەرگیدا وەسیەتی بۆ (یەزید) کرد تەرمەکەی هەڵبگرێت‌و لە دواسنووری بەرەی بەرەنگاربونەوەی دوژمن‌و لە جێی پێکۆڵی سمی وڵاخە بەرزەکاندا بینێژێ، – یەزید– وەسیەتەکەی جێبەجێ کرد[1]. ئەمەو سەروەریەکانی جەنگی (قوستەنتینیە) کەوتونەتە سەرشانی (یەزید)، ئەگەر چی (الذهبی) زۆر هێرش دەکاتە سەر یەزید بەڵام ئەم ڕاستیە حاشا هەڵنەگرە وای لێ کردووە بڵێ: (یزیدی کوڕی معاویە أبو خالدی ئومەوی) دارای چەند شتێکی جوانی وەك: (غەزای قوستەنتینیە)یە، ئەو فەرماندەی سوپاکەی بوو کە لەنێویدا وێنەی (أبو أیوبی ئەنصاری) هەبوو[2]. تەماشاکەن وتەی (إبن تیمیة) سەبارەت بەئەمە چەند بە جێیە ! کە دەڵێ: دەزانی تاکە کەسێك کۆمەڵێك چاکەو کۆمەڵێك گوناهەی هەیە، ستایش دەکرێت‌و زەمبیشی دەکرێت، پاداشتی دەدرێتەوەو سزاش دەدرێت، لەلایەکەوە خۆش دەویستری‌و لەلایەکی ترەوە ڕقی لە بەرانبەر دەنوێنری، ئائەمە مەزەبی ئەهلی سوننەت‌و جەماعەتەو، پێچەوانەی ڕای خەواریج‌و موعتەزیلەو هاوڕاکانیانە[3]. وەك لە غەزاکەدا دەبینری( یەزید) کە (ئوم کەلثوم)ی هاوسەری لەگەڵدا بوو، چەند هێرشێکی فیداکارانەی ئەنجامدان هەتا گەیشتە کەنداوی (قوستەنتینیە)[4]. وەکو دیارە: یەزید شارەزای جەنگی – گەل– ڕۆم بووەو، دەرکی بە مەترسی ئەوان بۆ سەرسنورەکانی ئیسلام کردووەو بەتەواوەتیش پابەندی ئامۆژگاریەکەی باوکی بووە، دوا وەسیەتی (معاویە)بۆ (یەزید) ئەمە بوو: (بەتوندی گەمارۆی

---

١ البداية والنهاية نقلا عن مواقف المعارضة (ص: ٦٢).

٢ سير أعلام النبلاء (٣٦/٤).

٣ منهاج السنة (٥٤٤/٤).

٤ أنساب الأشراف (٢٨٩/٤).

ڕۆم بدەو دەست لە بینەقاقای گیربکە)[١]. ئەم هۆکارگەلە وایان لە یەزید کرد دوای ئەوە بشبێ بەخەلیفە لە سەر جێبەجێکردنی نەخشەی جیهادی ڕۆم بەردەوام بێتو، ڕوداوەکانی (عبدالله ی کوڕی زوبێرو شیعەکانی عێراق) نەبنە بەربەست لە بەرانبەر جێبەجێکردنیدا[٢]. دوابەدوای ئەمە مەرگی (یەزید) دەبێتە مایەی حەسانەوەو پشودانی (ڕۆم)و لە یەخەبونەوەی هێرشی موسڵمانان بۆ سەر سەریان، بەڵکو وایان لێ دەکا زات بکەنو هێرشو پەلامارێکی بێ شومار بکەنە سەر وڵاتی شامو ناوچە سەرسنوریەکانی ئیسلام[٣]. هەمان ساڵ کە (یەزید) لە جەنگی (قوستەنتینیە) گەڕایەوە پێش خەڵك کەوتو حەجی ماڵی خودای کرد[٤]. بێ گومان ئەم چالاکیانەی (یەزید) لەو سەردەمەدا ئەنجامیدان ئەو پەڕی گرنگو بایەخدار بوون، وەك دەبینین یەزید دەبێتە سەرکردەی گەورەترین سوپای سەردەمی خۆی کە ژمارەیەك گەورە هاوەڵی هەڵبژاردەو ڕۆڵەکانی ئەوانی لە خۆ گرتووەو، بەرەو گرنگترین بەرەی دەوڵەتی ئیسلامی بەڕێ دەکەوێ، ئیدی ئەمەو چەند نیشانەیەکی تریش هەستی بەرپرسیاریو سەرکردایەتی کردنو لێوەشاوەیی یەزید لە بواری سەربازیو جەنگو ڕوبەڕوبونەوەدا دەر دەخەن –کە لەکاتی سەرکردایەتی کردنی ئەم سوپایەدا تەمەنی تەنها لە (٢١–٢٣) ساڵدا بووە–[٥]، لەم قۆناغەدا یەك کەس نەلە هاوەڵان نە لە خەڵکانی تر ڕەخنەیان لە سەرکردایەتیەکەی یەزید نەگرتووە، بەهەمان شێوە کاتێك (معاویە) ڕەزای خوای لێ بێت ئەم هەڵوێستە دەنوێنێو سەرکردایەتی کردنی ئەم سوپایە کە ژمارەیەك لە هاوەڵانو ڕۆڵەی هاوەڵانو زاناو شەرعزانو سەروەرانی ئۆممەتی لە خۆگرتووە بە یەزید دەسپێرێ، دیارە نیشانەگەلێکی جوامێرانەو پیاوەتیو نەجابەتو هەڵکەوتوویيو لێوەشاوەیی لە خودی یەزید دا هەبوونو، وایان لێکردووە شایستەی سەرکردایەتیکردنی ئەم سوپایە بێ[٦].

---

١ تأريخ خليفة (ص: ٢٣٩).

٢ خطط الشام (١١٢/١).

٣ فتوح البلدان للبلاذري (ص: ٢٢٤)، مواقف المعارضة (ص: ٦٣).

٤ تأريخ خليفة (ص: ٢١١)، مواقف المعارضة (ص: ٦٣).

٥ مواقف المعارضة (ص: ٦٣).

٦ مواقف المعارضة (ص: ٦٤).

## پێنجەم: گرنگترین سیفەتی یەزیدی کوڕی معاویە:

سەرچاوە مێـژوویی‌و ئەدەبیـەکان هـاتوون بـە شـێوەیەکی خێـرا چـەند نیـشانەیەکی کەسایەتی (یەزید کوڕی معاویە) یان خستونەڕوو و ئیـدی زۆر بەکـەمی باسـیان لـە سـیفەتی خودی‌و بۆ ماوەییەکانی ئەویان کردووە[١]، هەندێك لە سیفەتەکانی ئەمانە بوون:

١- بەهێزی‌و ئازایەتی:

(الذهبي) دەڵێ: بەهێزو ئـازاو خـاوەنڕاو پتـەوو زیـرەك‌و قـسە ڕەوان‌و زمانپـاراو بـووە[٢]، ئاواتە خوازبووە باوکی بیکاتە فەرمانـدەی ئـەو سـوپایانەی بـۆ هاوینـە هێـرش سـازدەکران، سوور بوو لـە سـەر سـازدانی پێـشبڕکە لـە نێـوان ئەسپـسواراندا، بـەخاتری بەرزبوونـەوەی ئاستی سوار چاکی لە نێو موسوڵماناندا خەڵاتی پێشکەش بە بەشـداربوان دەکـرد[٣]، زیـاد لـە مـەش توانـای خـۆی لـە سـەرکردایەتیکردنی ئـەو سـوپا ئیـسلامیەدا سـەلماند کەگـەمارۆی (قوستەنتینیە)ی داو، چالاکانە باڵی بەسەر ڕوداوەکانی نێو گۆڕەپانی جەنگەکەدا کێشابوو[٤]، (صـفوان ی کـوڕی عمـرو) دەڵـێ: کاتێـك سـوپای ئیـسلام دیلـە ڕۆمیـەکانیان ڕەپێـچەکدان، (یەزیدی کوڕی معاویە) بەبەرچـاوی ڕۆمەکانـەوە لـە گـەردنی دان[٥]. بەهـەمان جۆر (العـتبي) بەسەنەدی خـۆی سـەبارەت بـە بڕیـارە یەکلاکـەرەوەو پتـەوەکانی ئـەو دەڵـێ: (أبـو أیـوبی ئەنصاری) لە جەنگی (قوستەنتینیە)دا نەخۆش کەوت، یەزید سەری لێداو، پێی گووت: ئەی ئەبو ئەیوب چت پێویستە؟ وتـی: لای شـورەی (قوسـتەنتینیە) بمنێـژە... جاکاتێـك کۆچـی دوایـی کـرد یەزیـد فـەرمانی دا کفـن بکرێـت‌و بخرێتـە نێـو دارەبـازەوەو هەڵبگیرێت،ئـەمجا کەتیبەکانی بەڕێکردن، (قەیسەر) تەماشایکرد خەڵك لە نێو گۆڕەپانی جەنگدا شەڕە شمشێر دەکەن‌و موسوڵمانەکان دارەبازێکیان بەسەر شانەوە هەڵگرتووە،سـەبارەت بەئەمـە یـەکێکی بـۆلای یەزیـد نـارد: -کـە- ئـەوەی لـە نێـو دارە بازەکـەدا کێیـە؟ -یەزیـد- وتـی: هـاوەڵی پێغەمبەرمانەو داوای لێکردووین -بە مردویش بێ- بیهێنینە نێو وڵاتەکەتەوەو، ئێمەش یـان گیانمان بەخت دەکەین یان وەسێتەکەی بەجێ دەگەیەنین، -قەیسەر- وتی: تـۆش هـاوەڵی پێغەمبەرەکـەت بەسـەر شـانتەوە دێنیـت‌و لـە وڵاتـی ئێمـە بـە خـاکی دەسـپێری! هـەر کـە

١ مواقف المعارضة (ص: ٤٦).

٢ سير أعلام النبلاء (٤/٧).

٣ الأقوال الكافية في الفصول الشافية في الخيل (ص: ٣١٢).

٤ مواقف المعارضة (ص: ٤٧).

٥ تأريخ مدينة دمشق، نقلا عن مواقف المعارضة (ص: ٤٧).

گەڕایەوە دەری دەهێنینەوەو دەرخواردی سەگەلی دەدەین، یەزید وتی: سوێند بێ بەخودا: مـن نیـازم نـەبووە بـەخاکی ولاتـی ئێـوەی بـسپێرم هـەتا وشـەکانی خـۆم بـە گـوێی ئێـوە نەسپێرم،تۆ دەرهەق بەو ڕێزو حورمەتـەی بـۆ ئـەو بـەڕەوابینراوە بـێ بـاوەڕی، ئەگـەر پـێم ڕابگەیەنرێ گۆڕەکەی هەڵدراوەتەوە یان تەرمەکەی شێوێنراوە، ئەوا لە بەرانبـەردا قەلاچـۆی تـەواوی نەسـڕانیەکانی خـاکی عـەرەب دەکەم،تـەواوی کەنیسەکانیـشیان بەسـەر یەکـدا دەڕوخێنم، جا قەیسەر بەپەلە نوێنەری خۆی بۆلای ناردەوەو پێی وت: باوکت لەتۆم چـاکتر دەناسیێ کە چۆنم،بەهەقی مەسیح بەدەستی خۆم دەیپارێزم[1].

٢- شێعرو ڕەوانبێژی:

الذهبي دەڵـێ:-یەزیـد- ڕەوانبێـژ بـووە[2]. هـەرکات لـەلای (معاویـە) خـەڵکانی قـسەزانو وتاربێژ دەکەوتنە قسە کردن، (معاویە) دەیگوت: وەڵلاهی دەبێ خـەتیبی دەنگگـەورەیان لێ ئێزن دەم، یەزید هەستە قـسە بکـە[3]. (المـدائني) بەسـەندی خـۆی دەگێڕێتـەوە: پیاوێـك بـە (سەعیدی کوڕی موسـەییەب)ی گـوت:ئـەو کەسـانە کـێن کـە لـە نێـو قوڕەیـشدا بـە وتاربێـژ ناسراون؟ -لە وەلامدا- وتی: معاویەو، یەزیدی کوڕیو، مەڕوانی کـوڕی حەکـەمو، عبـداللمك ی کـوڕیو، سـەعیدی کـوڕی عـاصو، کوڕەکـەیو، عبـدالله ی کـوڕی زوبێـریش لـە ئـەوان کەمترنیە[4]، بەلام سەبارەت بە شـێعروتنی لـە ڕاسـتیدا شـاعیرێکی بـەتوانا بـوو و بـە باشـی شێعری دەوت[5]. ئەمە وایکردبوو خەڵك بڵێن: شێعر بە مەلیك دەسـتی پێکـردو بـە مـەلیکیش کۆتایی پێهێنرا، هەڵبەتە ئاماژەیە بۆ (إمرؤ القيس و يزيد)[6]. هارونەڕەشیدیش ئەم شـێعرەی بە هی یزید دەخوێندەوە:

إنها بـين عـامر بـن لؤَيٍّ حـين تَنْمي وبين عبد مناف

ولهـا في المُطَيَّبين جـدودٌ ثم نـالت مكـارم الأخْلاف

بنـتُ عمِّ النبي أكـرمُ مـن يمشي بنعل على التُّراب وحافي

لن تراها على التَّبَذُّل والغلظة إلا كـدرة الأصـداف[7].

---

١ الاستبصار نسب الصحابة من الأنصار (ص: ٧٠، ٧١)، للمقدسي.

٢ سير أعلام النبلاء (٣٧/٤).

٣ البيان والتبيين للجاحظ (١٢٢/١).

٤ أنساب الأشراف (٢٨٩/٤).

٥ مواقف المعارضة (ص: ٤٩).

٦ الفخري في الآداب السلطانية (ص: ١١٣)، إبن طبا طبا.

٧ البداية والنهاية (٦٥٥/١١).

٣- بەخشەندەیی:

یەزید بە بەخشندەیی ناوبانگی دەرکردبوو، سامانی زۆری دەدا بە عبدالله ی کوڕی جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب[1]. ئەمە نامۆ نەبوو، چونکە بۆ خۆی گوتبوی: پاراستنی هاونشینو هاودەمو ڕێزلێگرتنیان ڕەنگدانەوەی بەخشندەیی خەلیفەو پێدانی مافی ئەو نازو نیعمەتەیە بەسەریدا ڕژاوە[2]. عبدالله ی کوڕی جەعفەر بەم خەڵاتە گەورەیە سەرسام دەبێو پێی دەڵێ: دەك بابو دایكمت بە فیدابن، وەڵلاهی پێش تۆ ئەم قسەیەم بەکەس نەوتووە[3]. هەروەها دەیگوت: ئەوە لەسەر ئەوە ڕام سەبارەت بەیەزید چاکە لۆمەم دەکەن؟[4]، بەڵگەیەکی تر لەسەر دلاوایی یەزید: کاتێك عبدالله ی کوڕی خەنزەڵە بە خۆیو بە کوڕەکانی لە (مەدینە) ڕا هاتو سەردانی کرد، یەزید سەد هەزاری دا بەخۆیو، دەهەزاریشی دا بە هەر یەکێك لە کوڕەکانی، ئەمە بێ لەوەکە پۆشاکی پێدانو بارگەی تەواویشی بۆ پێچانەوە[5]. بەسەرهاتەکەی پێشداشی لە گەڵ ئەحنەف -کەپێشتر خوێندمانەوە- ئەم ڕاستیە بەهێزتر دەکا.

**سیفەتە جەستەییەکانی یەزید:** جەستەی گەورەو پتەو و قەڵەو بوو، قەڵەمی پەنجەکانی ئەستور بوون، قژی پڕو لولپێچ بوو،پێستی ڕەنگئەسمەر بوو، شوێنی خروێلکە بەسەر دەمو چاویەوە مابوو، چاوی ڕەشو گەورە بوون، ڕیشێکی تەنکی بەردابۆوە، بەکورتی ناسكو جوان بوو[6].

## شەشەم: بەیعەتدان بە یەزید:

کاتێك (معاویە) ئەجەلی هاتو کۆچی دوایی کرد، یەزید لەوێ نەبوو، تا هاتەوە نێژرابوو، بەرەو دەرگای بچوك -ئەو شوێنەی بابی لێی نێژرابوو- بەڕێکەوت، بە پێشەوایەتی ئەو خەڵکەی بەدوایەوە بوون نوێژی مردووی دابەستو چوار جار (الله أكبر)ی لەسەر کرد،[7] کە لە گۆڕستان هاتە دەر، ولاخە بەرزەکانی کۆشکی خیلافەتی بۆ هێنران، ئەمجا چووە نێو

---

١ البداية والنهاية (١١/٦٤٦).

٢ أنساب الأشراف (٤/٢٩٧).

٣ أنساب الأشراف (٤/٢٩٧)، القيد الشريد، ابن طولون ورقة (٣)..

٤ البداية والنهاية (١١/٦٤٦).

٥ تأريخ خليفة (ص: ٢٣٧)، البداية والنهاية (١١/٥٣).

٦ سير أعلام النبلاء (٤/٣٧)، البداية والنهاية (١١/٦٣٨).

٧ البداية والنهاية (١١/٤٥٩).

شارەوە، فەرمانی کرد جاڕ بەنێو خەڵکدا بدرێتو کۆببنەوە، بانگ دراو وترا نوێژی جەماعەت دەکرێت، جا چووە نێو کۆشکی سەوز (خضراء)وە -کە باوکی دروستی کردبوو-، خۆی شۆریو پۆشاکێکی چاکو جوانی پۆشی، ئەمجا هاتە دەرەوەو بۆ یەکەمین جار بە سیفەتی ئەمیری ئیمانداران یەکەم وتاری خۆی خوێندەوە، پاش حەمدو سەنا بۆ خودا وتی: ئەی خەڵکینە، معاویە یەکێك بوو لە ڕیزی بەندە بچووکەکانی خودا، خودا نازو بەهرەی خۆی پێ ڕەوا بینیو ئەمجا بۆ لای خۆی گێڕایەوە، ئەو لە خەڵکانی دوای خۆی چاکتر بوو، لە خەڵکانی بەر لە خۆشی نزمتر بوو، حەدم نیە پێش خودای گەورە بدەمەوەو بە شانو باڵی هەڵبدەم، ئەگەر لێی ببوورێت ئەوا بە هۆی ڕەحمەتی (خودا) خۆیەتی، ئەگەر سزایشی بدات ئەوا بە هۆی تاوانی (معاویە) خۆیەتی، من دوای ئەو بوومە سەرپەرشتیکار، لەسەر سەرخستنی هەق کەمترەخەم نابم، بۆ بەزایەدانی ناهەقیش پاساو ناهێنمەوە، ئەگەر خودا ویستی لەسەر شتێك بێ دێتەدی، لە درێژەی وتارەکەیدا وتی: معاویە جەنگی نێو دەریای پێ کردوون، من بە تۆبزی هیچ موسڵمانێك نابەمە نێو دەریاوە، معاویە زستانان هێرشی پێ دەکردنە نێو خاکی ڕۆمەوە، من زستانە هێرش بە کەس ناکەم، معاویە موچەکەی بە سێ بەش پێ دەدان، من بە یەك گوژمە پێتان دەدەم، ئیتر خەڵك بڵاوەکێنەیان لێ کردو کەسیان لە ئەو بە لەپێشتر دانەنا،[1] یەزید لە وتارەکەیدا سیاسەتی خۆی لە سەرکردایەتی کردنی ئوممەتدا لێکدایەوەو، نەخشەی کاری خۆی -کە بڕیارە لەمەولا لە میانەی خیلافەتەکەیدا پێیەوە پابەند بێت- خستەڕوو، بەم سیاسەتەی توانی دڵی دانیشتوانی شام بۆ لای خۆی ڕاکێشێت، لە ڕاستیدا زۆرینەی ئوممەت لەسەر بەیعەتدان بە یەزید یەکدەنگ بوو، بە واتایەکی تر، دوای کۆچی باوکی بەیعەتی خیلافەتی بۆ تازە کرایەوەو، تەنها (حوسێنی کوڕی عەلیو عبداللە ی کوڕی زوبێر )(ڕەزای خوایان لێ بێت) بەیعەتیان پێ نەدا.[2] لەمەولا بە ئیزنی خودا وردەکاریەکانی نێوان ئەوانو یەزید دەبینین.

گەورە هاوەڵانی وەك (عبداللە ی کوڕی عباسو عبداللە ی کوڕی عمرو محمدی کوڕی حنفیە) لە پێناو یەکدەنگیو پاراستنی یەکبوونی ئوممەتو سەرهەڵنەدانی ئاشوبی نێوخۆ بەیعەتیان بە یەزیددا.[3] دانیشتوانی شامو عێراو تەواوی هەرێمەکان جگە لە بەشێکی زۆری

---

١ البداية والنهاية (١١/٤٦٠).

٢ البداية والنهاية (١١/٤٦٧)، العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ١٣٠).

٣ العالم الاسلامي في العصر الأموي (ص: ١٣٠).

دانیشتوانی حیجاز بەیعەتیاندا، ئەم خەڵکەی حیجاز بە سەرکردایەتی حوسێنی کوڕی عەلیو عبدالله ی کوڕی زوبێر بەرهەڵستی بەیعەتەکەیان کرد، عبدالله ی کوڕی همّام بە بۆنەی کۆچی دوایی معاویە پرسەنامەیەك بە هۆنراوە ئاراستەی یەزید دەکاتو لە هەمان کاتدا پیرۆزبایی بەیعەتەکەشی ئاراستە دەکاتو دەڵێت:

| | |
|---|---|
| إصبر يزيد أعظم فقد فارقت ذا مقة | واشكر حُباء الذي بالملك حاباكا |
| لا رُزءَ أعظــم في الأقـــوام نعـلمه | كـــما رُزِئت ولا عُقبى كعُقباكا |
| أصبحت راعــي أهـــل الدين كلهم | فـــأنت ترعــــاهم والله يرعـاك |
| وفي معاويــة البــــاقي لنـــا خلف | إذا نعيـــــت ولا نسمع بمنعـاك[1] |

ئەمەو یەزید لە ڕەجەبی ٦٠ك/٦٨٠ز جێگەی بابی گرتەوەو جڵەوی حوکمی گرتە دەستو بڕیاریدا والیەکانی لە مەڕ باوکی لە پۆستەکانی خۆیاندا بێڵێتەوە، ئەوکات:( وەلیدی کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبی سوفیان) والی مەدینە بوو، (عەمروی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص) ئەمیری مەککە بوو،(نوعمانی کوڕی بەشیر ) والی کوفە بوو، لە بەصرەش (عبیدالله ی کوڕی زیاد) والی بوو،[2] یەزید پێداگیری لەسەر وەرگرتنی بەیعەت لەو کەسایەتیانە کردەوە کە لە حاڵی حەیاتی باوکیدا بەیعەتیان پێ نەدابوو، ئەو زۆری مەبەست بوو حوسێنی کوڕی عەلی بەیعەت بدات، جا نامەیەکی ئاڕاستەی (وەلیدی کوڕی عوتبە)ی والی مەدینە کردو هەواڵی مەرگی باوکی تێدا ڕاگەیاندبوو، وتبووی: بسم الله الرحمن الرحيم، لە یەزیدی ئەمیری ئیمانداارانەوە بۆ وەلیدی کوڕی عوتبە، دوای ئەمە: معاویە بەندەیەکی نێو بەندەکانی خودا بوو، خودا ڕێزی لێگرتو کردی بە خەلیفە، هەلی بۆ ڕەخساندو دەسەڵاتی بۆ چەسپاند، بە قەدەری خودا ژیاو بە ئەجەل کۆچی دوایی کرد، خودا بەزەیی پێدا بێتەوە، بەستاشکراوی ژیاو لەسەر چاکەو پارێزکاری مرد والسلام.[3]

وەلیدی کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبی سوفیان کەسێکی لاشەڕو خۆشخوڵق بوو، لەبەر ئەمە دەرهەق بە حوسێنو عبدالله ی کوڕی زوبێر نەرمونیانو ئاسانکار بوو، نەهات تۆبزییان لێ

١ الشعر والشعراء لإبن قتيبة (٢/ ٨٥٢).
٢ البداية والنهاية (٤٦٧/١١).
٣ البداية والنهاية (٤٦٧/١١).

بکات‌و بەیعەتیان لێ بستێنێت،[١] ئەو پیاوێکی بە بەزەیی‌و بەخشندەو جوامێر بوو،[٢] زۆر لە سزاو تۆڵەی خودا دەترسا، لەبەر ئەمە پەنای نەبردە بەر بەندکردن یان کوشتنی حوسێن، ئەو دەیوت: سوێند بێ بە خودا ئەگەر هەموو سامانی دونیاو ئەوەی تیشکی خۆری بەر کەوتبێت لە بەرانبەر کوشتنی حوسێندا بمدەنێ نامەوێ، سبحان الله! حوسێن بکوژم، هەر لەبەر ئەوە دەڵێ: بەیعەت نادەم! بە خودا باوەڕ ناکەم کەسێك لە قیامەت‌و لە لایەن خودا حیسابی خوێنی حوسێنی لەگەڵ بکرێت تاتەرازووی خراپەکانی سووك بێت، مەڕوان وتی: ئەگەر ئەمە بیروڕات بێ ئەوا پێکاوتەو کارت دروستە.[٣]

یەکەم چەخماخەی ئاشوبی نێوخۆ کە لە نێو موسڵماناندا لێدرا، بە هۆی سووربوونی یەزید بوو لەسەر وەرگرتنی بەیعەت لە حوسێن‌و عبدالله ی کوڕی زوبێر، هەر کامێك لەم دووانە بۆی دەرکەوتبوو: ئەگەر بەیعەت نەدا دەبێتە قوربانی هەواو بیرە هەرزەکەی یەزیدو شمشێری پشتیوانانی خەلیفەی تازەی لە ڕوودا ڕاست دەکرێتەوە، بۆیە هەردووکیان مەدینەیان بەجێ هێشت‌و پەنایان بە خوا گرت‌و خۆیان لە حەرەمی مەککەو بەیتولحەڕام پەنادا.

کاتێك یەزید کاربەڕێوەبەرەکانی سەردەمی باوکی بەسەر ویلایەتەکانی باوکیدا جێگیر کردنەوە کارێکی چاکی کرد، چونکە ئەمە ببوە چەسپاندنی ئاسایش لەو هەرێمانەدا، بەڵام دوایی زیرەکیەکەی خیانەتی لێکردو بەسەر تەڵەی هەڵەی دابرد، کاتێك سووربوونی خۆی ڕاگەیاند بۆ بەزۆر بەیعەتدانی حوسێن‌و عبدالله ی کوڕی زوبێر، ئەم شێوازە داوایەکی هەڕەشەی تۆقاندن‌و کوشتنی پێوە بوو، (حوسێن‌و عبدالله) بۆیان ڕوون بۆوە مانەوەیان لە ژێر چەتری حکومەتەکەی یەزیددا بە ترس‌و تۆقاندن تۆق دراوە، بۆیە بیریان لە جێگای ئەمان‌و زەمان کردەوە، ئەم ئەمان‌و زەمانەشیان دەست نەکەوت تەنها لە ڕێی چەکدارکردنی لایەنگرەکانیانەوە نەبێت، خۆیان‌و هێزە سەربازیەکەیان لە مەککە جێگیر کرد –کە بۆ یەزیدو پشتیوانانی گران دەوەستێ دەستی بیانگاتێ– ئەوان لە پەنا ماڵی خودا خۆیان

١ اخبار الطوال (ص: ٢٤٨)، يزيد بن معاوية للعقيلي (ص: ٢٨).
٢ تأريخ خليفة (ص: ٢٣٣)، يزيد بن معاوية (ص: ٢٦).
٣ تأريخ الطبري (٦/٢٥٩).

حەواندەوە کە خـودا دەربـارەی فەرموویـەتی: ﴿وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنًا﴾[1] واتـە: هـەر کەسـێك داخڵی ببێ دالّدەدراوە. بەرهەمی ئەم کۆبونەوەو خۆچەکدارکردنە لەدەستدانی ژیان‌و گیـانی هەزاران موسڵمانی لێکەوتەوە، لە سـەرووی هەمووشـیانەوە لـە دەسـتدانی حوسـێنی کـوڕی عەلی (ڕەزای خوای لێ بێت)کە لە کەربەلاو لە لایەن تاقمێکی سـتەمکاری نێـو سـوپای یەزیـد شەهیدکرا.[2] ئەمە بەرهەمی تاڵی هەڵە پـڕ هەڵەشـەکەی یەزید بـوو، ژیـانی حـوکمڕانی بەمـە دەستی پێکردو هـەتا مردنیـشی لێـی جـودا نـەبۆوەو نـەیتوانی لێـی دەربـاز ببـێ ، زنجـیری هەڵەکانی خەلیفە ڕۆژ بە ڕۆژ لێك دەکشایەوەو ئاڵقەکانی زۆرتردەبوون.

لەگـەڵ زۆربـوونی کاروبارەکـان هەڵـەکان گـەورەتر دەبـوون، گوریـسی گرفتـەکان گـرێ کوێرەی زیاتریان تێ دەکەوت، هەر کە خەریکی چارەسـەری کێشەیەك دەبـوو، کێـشەیەکی سامناکتر ڕووی تێ دەکرد، سەرەتای کێشەکان ڕژدبوونی یەزید لەسەر بە تۆبزی بەیعەتدانی حوسـێن‌و عبـدالله ی کـوڕی زوبێـر دەسـتی پێکـرد، ئـەمجا سـەری کێـشا بـۆ دروسـتبوونی بەرەیەکی بەرهەڵستکارو ئامادە بۆ جەنگ‌و کوشتار، لەوێشەوە بـەرەو کارەسـاتی کەربـەلاو کارەساتی کوژرانی کوڕی کیژی پێغەمبـەری خـودا (ﷺ)، ئـەمجا تووڕەبـوونی موسـڵمانان‌و ڕاگەیاندنی عبدالله ی کوڕی زوبێر بۆ دەرچوونی لـە دژی خەلیفـە، ئەمـەش سـەری کێشا بـۆ ڕوودانی کارەساتەکەی (حرّة)، بەمـە دەم‌و چـاو و ڕەنـگ‌و ڕووی خەلیفـە لەبـەر چـاو و دڵـی موسڵمانان بێزرا، هێندەی پێ ناچێ دوای ئەم ڕووداوانە کۆچی دوایی دەکـات، ئـیتر خـەونی معاویە دەربارەی وەلی عەهدەکەی چی لێ بەسەر هات؟

بە گوێرەی زۆربەی بۆچوونەکان، یەزید لەبەر چەند هۆیەك کەوتە نێـو تەڵـەی ئـەم هەڵـە گەورانەوە، وەك نەبوونی ڕاوێـژکاری دانـاو زانـا بـە دەورەیـەوەو، کـەمی تەمـەنی‌و نـەبوونی شارەزاییەکی پێویـست‌و، لـە هـەمان کاتـدا یەزیـد عـەقڵی بـاوکی نـەبوو و، ئـەو کەسـایەتیە بەهێزەشی نەبوو تا بتوانێـت کێشەکان بـە ئاشـتی‌و بـێ ڕوودانـی ئـاژاوە چارەسـەر بکـات، کوژرانی حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت)و کارەساتی (حرّة)ی مەدینەو، گـەمارۆدانی مەککـەو

---

١ ال عمران (٩٧).

٢ الأمويون بين الشرق والغرب (١٩٨/١).

بە ئامانجگرتنی عبدالله ی کوڕی زوبێر تێیدا چەند کارەساتێکی گەورە بوون لەسەردەمی یەزیدا ڕوویاندا.

لە ڕاستیدا یەزید مۆرێکی ڕەشو تۆخی بە تەوێڵی سەردەمی حوکمڕانی خۆیەوە نا، کە بە هەموو ئاوی دەریاکان لاناچێتو، ئاویی شیرینو زوڵاڵی ئەو دەریایانەش ناتوانن تاڵاییەکەی بگۆڕن.[1]

(ئەهلی سوننەتو جەماعەت) بەیعەتەکەی یەزید بە دروست دادەنێن، بەڵام دوو ڕەخنەی لێ دەگرن:

١ـ معاویە شتێکی نوێی لە حوکمڕانیدا داهێنا ئەویش گواستنەوەی پۆستی خیلافەت لە باوکەوە بۆ کوڕو نەوەو نەتیجە بوو، هەڵبەتە دوای ئەوە دیاریکردنی خەلیفە بە دەست ئەهلی حەللو عەقد بوو حیساب بۆ نزیکایەتیو خزمایەتی نەدەکرا چ جای بۆ کوڕ! لێرەدا ئەهلی سوننەتو جەماعەت ئەم ڕێوشوێنە نەویاوەی معاویە لەدەستاودەستکردنی پۆستی حوکمڕانی لە باوکەوە بۆ کوڕ بەبێ تێڕوانین بۆ جۆری کەسایەتیەکە ڕەت دەکەنەوە.

٢ـ لە ڕوانگەی ئەهلی سوننەو جەماعەتەوە ئەو کاتە معاویە یەزیدی بە وەلی عەهدی خۆی دەستنیشان کرد، خەڵکانی باشو شیاوتر لە ئەو هەبوون، وەك: عبدالله ی کوڕی عمرو عبدالله ی کوڕی زوبێرو حوسێنی کوڕی عەلیو کەسانی تریش.[2]

ئەمما بەبۆچوونی شیعە دەبێ ئیمامەت یان خیلافەت تەنها لە عەلیو شەجەرەی عەلیدا بێ، ئەوان ڕەخنە لە خودی بەیعەتەکەی یەزید ناگرن، بەڵکو ڕەخنەیان ڕووی لە هەر هەموو ئەو بەیعەتانەیە کە بۆ غەیری عەلیو ڕۆڵەو نەوەکانی بەستراونو دەبەسترێن، ڕەخنە لە بەیعەتی أبوبکرو عمر عثمانو معاویە دەگرن، چونکە بە لای ئەوانەوە ئەم مافە بە دەق–ی قورئانو فەرموودە– بۆ عەلیو شەجەرەی عەلی چەسپاوەو هەتا قیامەت هەر ئاوا دەمێنێتەوە.[3]

لە کتێبی (أمیر المؤمنین علي بن أبي طالب)دا بیروباوەڕی شیعەم دەربارەی ئیمامەت لێکداوەتەوەو، بە تایبەتیش ئەم بۆچوونەیانم پوچەڵ کردۆتەوە.

---

١ الأمويون بين الشرق والغرب (١/١٩٩)، بتصرف كبير.

٢ حقبة من التأريخ (ص: ١٢٤).

٣ حقبة من التأريخ.

# باسی دووەم

## دەرچوونی حوسێنی كوڕی عەلی (ڕەزای خوای لێ بێت)

## یەكەم: ناو و، ڕەچەڵەك و، بەشێك لە سەروەریەكانی:

أبو عبدالله، حوسێنی كوڕی علی كوڕی أبی طالب ی كوڕی عبدالمطلب ی كوڕی هاشم. حوسێنی كوڕی فاطمەی كچی پێغەمبەری خودا (ﷺ) و كچەزاو جگەر گۆشەو ڕێحانەو خۆشەویستی پێغەبەر (ﷺ) ، ساڵی ٤ی كۆچی لە دایك بووە و، لەڕۆژی عاشورا – ١٠ی محرم–ی ساڵی ٦١كۆچی لە كەربەلای عێراق بە شەهیدی كۆچی دوایی كرد– خودا لێی ڕازی بێت‌و ڕازیشی كات[1]. سەبارەت بە سیفەت‌وسەروەریەكانی فەرمودەیەكی زۆر هاتوون، بۆ نمونە:

١– ئیمام أحمد بە سەنەدی خۆی لە (یوعلای عامیری)یەوە دەگێڕێتەوە: كە ئەو لە خزمەت پێغەمبەری خودا (ﷺ)دا بۆ دەعوەتێك دەچێ، (یوعلا) دەڵێ: پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە بەرانبەر خەڵكەكە ڕاوەستا،(حوسێن)یش لەگەڵ پۆلەمنداڵێك یاری دەكرد، پێغەمبەر (ﷺ) ویستی بیگرێ، ئەویش دەمێك بەملادا خۆی ڕادەپڕوچكاندو دەمێك بەولادا خۆی ڕادەپڕوچكاند، پێغەمبەریش (ﷺ) لەگەڵی پێكەنی هەتا دەرفەتی لێ هێناو گرتی، دەستێكی لە پشتە ملی‌و ئەوەی تریشی لە بن چەناگەی قایم كردو دەمی خستە سەردەمی‌و ماچی كردو فەرمووی: (( حُسَيْنٌ مِنِّي وَأَنَا مِنْ حُسَيْنٍ ، أَحَبَّ اللهُ مَنْ أَحَبَّ حُسَيْنًا ، حُسَيْنٌ سِبْطٌ مِنَ الأَسْبَاطِ)).[2] واتە: حوسێن لە منەومنیش لە حوسێنم، خودایە هەركەسێك حوسێنی خۆش دەوێ خۆشت بوێ، حوسێن یەك ئومەتێكی تەواوە.

٢– بوخاری بە زنجیرە سەنەدی خۆی لە (عبدالله ی كوڕی عمر)ی وە دەگێڕێتەوە: كابرایەكی عێراقی پرسیاری لێ كرد: ئەگەر كەسێك لە ئیحرامدا بێ‌و مێشێك بكوژێ چی دەكەوێتە سەر؟ ئەویش (خوا لێی ڕازی بێت) لەوەڵامدا وتی: خەڵكی عێراق كە كوڕی كچی پێغەمبەری خودا (ﷺ)یان كوشتووە–و خوێنی ئەویان ڕشتووە– لە خوێنی مێش‌ومەگەز دەپێچنەوە، ئەمە لە حاڵێكدا كە پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێ: ((هُمَا رَيْحَانَتَايَ مِنَ الدُّنْيَا)).[3] واتە: – حەسەن‌و حوسێن– هەردوكیان دوو چڵە ڕێحانەی منن لەدونیادا.

---

١ سير أعلام النبلاء (٢/٢٨٠)، الاصابة (١/٣٣١، ٣٣٤).

٢ فضائل الصحابة للإمام أحمد (٢/٧٧٢) إسناده حسن.

٣ البخاري رقم (٣٧٥٣).

٣- ئیمام أحمد بەسەنەدی خۆی لە أبو سعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: ((الحَسَن وَالْحُسَيْنَ سَيِّدَا شَبَابِ أَهْلِ الْجَنَّةِ))[١].واتە: حەسەنو حوسێن سەروەری لاوانی بەهەشتن، ئەم فەرمودانە کەمێك بون لەو فەرمودە زۆرانەی باس لە شکۆداری (حوسێن) دەکەن، لە دڵی خۆمدا گرتووە بەئیزنی خودا کتێبێکی سەربەخۆ سەبارەت بە أبو عبدالله حوسێنی کوڕی عەلی ڕەزای خوای لێ بێت بنوسم.

## دووەم: هۆکارەکانی دەرچوونی حوسێن و ئەو فتوایەی دەرچونەکەی لە سەر بنیاتنا:

حوسێن لە ئاست بەیعەتەکەی یەزیددا نەیاربوو و، عبدالله ی کوڕی زبێریش لەم هەڵوێستەیدا بەشداری کرد، هەردووکیان بە هۆکاری داکۆکی کردن لەسەر سیستەمی شوڕاو هەڵبژاردنی چاکترین کەس تا کاروباری ئوممەت بەڕێوەبەرێ ئەم هەڵوێستەیان بە کردار سەلماند، هەروەك لە پێشدا-و لە باسی حەسەن دا- زانیمان حوسێن لەبەرانبەر صوڵحەکەی نێوان معاویەو حەسەن نەقایل بوو، بەڵام بەحوکمی ئەوە کەپێویست بوو شوێن حەسەنی کوڕی عەلی برای بکەوێ قبوڵی کرد، لەلایەکی ترەوە بەردەوام پەیوەندی بەدانیشتوانی کوفەوە دەکردو، بەڵێنی پێ دەدان کە دوای مردنی معاویە هەڵوێستی بەرهەڵستکارانە دەنوێنێ، بەڵگەی ئەم ڕاستیە: تەنها بە بیستنی هەواڵی مەرگی معاویە سەرانی کوفە دەستیان بەناردنی نامەو نامە کاری کرد بۆ حوسێنو داوایان لێ دەکرد بە پەلەو بێ دواکەوتن بۆ لایان بەڕێ بکەوێ[٢]. چەند هۆکارێك بۆ دەرچوونی حوسێنی کوڕی عەلی ڕەزای خوایان لێ بێت .

١- ویست و قەدەری خودای گەورەو بەدەسەڵات، بێگومان هەچ شتێك نەخشەی خودای بۆ کێشرابێ دەبێ بێتەجیێو، ئەگەر هەموو خەڵك هەوڵوتەقالای خۆیان بخەنە گەڕ ناتوانن بەر بە ڕوودانی بگرن ، کەس ناتوانێ بڕیاری نەگۆڕی خودای پاکو بەرز هەڵوەشێنێتەوە[٣].

٢- -هەڵگەڕانەوەی حوکمی شورا بۆ حوکمی مەلەکیو ویراسی: هەروەها پابەند نەبوونی معاویە بەمەرجەکانی صوڵحەکەی گەڵ حەسەن، بەتایبەتی ئەو مەرجەی کە (إبن

---

١ سنن الترمذي (٦٥٦/٥) رقم (٣٧٦٨)، صححه الالباني في الاحاديث الصحيحة (٤٤٨/٢).

٢ مواقف المعارضة (ص: ١٨٠).

٣ المصدر نفسه (ص: ٢٤٠).

الحجر الهيثمي) باسی لێکردووە: ...کە دەبێ دوای معاویە حوکمڕانی لەنێو موسڵماناندا بە شورا ڕێك بخرێ[١]. بەبۆچوونی حوسێن هەوڵ‌و تەقالاکانی معاویە بۆ بە مڵکایەتی کردنی حوکم بۆ بنەماڵەیەك‌و ڕادەستکردنی ئەو پۆستە لە (معاویە)ی باوکەوە بۆ (یەزید)ی کوڕی بە ئاشکرایی پێچەوانەی سیستەمی ئیسلامە لە حوکمڕانیدا، لە گەڵ ئەمەشدا ئەو بەحوکمی بەجێگەیاندنی بەیعەتەکەی‌و پابەندبوونی بەو پەیمانەی کە لەئەستۆی دابوو لەدژی معاویە دەرنەچوو[٢]. بەڵام دوای کۆچی دوایی معاویە گۆڕان بەسەر هەڵوێستی دا هات، حوسێن تەماشای کرد بەیعەتی هیچ کەسێکی لە ئەستۆدا نیە تا گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەرداری بۆ بنوێنێ، لە لایەکی ترەوە هەوڵدانی (وەلیدی کوڕی عوتبە)ی والی مەدینە بۆ سەندنی بەیعەت لە حوسێنی کوڕی عەلی‌و عبدالله ی کوڕی زوبێرو، پاشان دەرچوونی هەردوکیان بۆ مەککە بەبێ ئەوەی بتوانێ بەیعەتیان لێ وەربگێ بەڵگەیەکی ڕون‌و ئاشکرایە بۆ ئەمە[٣].

هەڵوێست‌و فتوای حوسێن لەدژی حوکمی ئومەوی بەدوو قۆناغدا تێپەڕی:

یەکەم/ قۆناغی نەدانی دەستی بەیعەت بەیەزید و، ڕۆیشتنی بۆ مەککە:

حوسێن لەم قۆناغەدا هەڵوێستی سیاسی خۆی لەسەر بنەمای تێڕوانینی شەرعیانەی خۆی لە بەرانبەر حوکمڕانی بنەماڵەی ئومەوی بە تایبەت خیلافەتی یەزید بنیاتنا، بەبۆچونی ئەو دروست نیە بەیعەت بە یەزید بدرێ لەبەر دوو هۆ: یەکەم: لایەنی کەسایەتی، بەهۆی نەبوونی مەرجی دادپەروەری تێیدا، کەواتە یەزید شیاو نیە بکرێتە خەلیفەی موسڵمانان[٤]، هەروەك چۆن دەبینرێ حوسێن بۆ وەرگرتنی پۆستی خیلافەت لەڕووی زۆری زانست‌و چاکی‌و پاکی‌و لێوەشاوەیی‌و شیاو بوون‌و چونە نێو دڵ‌و دەرونی جەماوەرەوە لە یەزید لەپێشترە. دووەم/ لایەنی سیاسی: بەهۆی نەبونی مەرجی شوراو، قۆرخکردنی دەسەڵات بۆ بنەماڵەی ئومەوی، کەڕێك پێچەوانەی پەیڕەوی ئیسلامە بۆ حوکمڕانی.

لەلایەکی دیکەوە حوسێن لە بەرانبەر ئەم فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ)دا نادیدە نەبوو. کە دەفەرمووێ: ((مَنْ مَاتَ وَلَيْسَ فِي عُنُقِهِ بَيْعَةٌ ، مَاتَ مِيتَةً جَاهِلِيَّةً))[٥].واتە: هەرکەسێك بمرێ‌و بەیعەتی– هیچ پێشەوایەکی– لە ئەستۆدا نەبێ، ئەوا بە شێوەیەکی جاهیلی دەمرێ،

١ الصواعق المرسلة (٢/٢٩٩).

٢ أنساب الاشراف (٣/١٥٢)، مواقف المعارضة (ص: ١٨٠).

٣ مواقف المعارضة (ص: ١٨٠).

٤ الفقهاء والخلفاء، سلطان حثيلين (ص: ٢١٠).

٥ مسلم رقم (١٨٥١).

بەڵام ئەو بەم جۆرە لە فەرمودەكە حاڵی ببوو، كە بەیعەت مافی كەسێكە كە بۆ خیلافەت شایستەو گونجاو بێتو، بەگوێرەی ڕاوێژی موسڵمانان دانرابێ[1]. بەیعەتنەدانی (حوسێن)یش واتە: نەدانی شەرعییەت بەحوكمی ئومەوی، هەر لەبەر ئەمەش بوو ئەوان جەختیان لەسەر بەیعەتدانی حوسێن دەكردەوەو، پێشتر زانیمان كە یەزید نامەی بۆ والی مەدینە نوسیبوو و فەرمانی پێ كردبوو بەیعەت لە حوسێنو عبداللە ی كوڕی عمر و عبداللەی كوڕی زوبێر بستێنێو، بۆ پێكانی ئەم ئامانجە دەبێ بیانگرێتو ناچاریان بكات بەیعەت بدەن[2]، لە هەمان كاتدا نەدانی بەیعەت ئاسانكارە تا بەوپەڕی ئازادی كارو چالاكی سیاسی ئەنجام بداتو هەر چ بڕیارێك بۆ خۆی بەگونجاوی دەزانێ بۆبەرهەڵستكردنی حوكمەتی ئومەوی بیدات.

قۆناغی دووەم/ قۆناغی هەڵێنانی هەنگاوی بەرهەڵستكارانەو خۆ دەستنیشان كردن بۆ جێگرتنەوەی حوكمەتی ئومەوی دیمەشق: ئەمە ئەوەیە كە شەرعزانان بە دەرچوون لەدژی ئیمامی وەسف دەكەن، لێرەدا پێویستە ئاماژە بەئەوە بدەین كە حوسێن بەر لە دەرچوونی بۆ عێراق ماوەی چەند مانگێك لە مەككەدا مایەوە، ئەو لە ٣/ شەعبان/ ٦٠ك بەرەو مەككە بەڕێ كەوتو لە ٨/قوربانی/ هەمان ساڵد بەرەو عێراق دەرچوو[3]. لەماوەی ئەم چەندمانگەدا- كە لە مەككە بوو- نامەگۆڕینەوە لە نێوان ئەوو خەڵكی عێراق دا ئەنجام دەدراو، نوێنەرانی ئەو وڵاتە سەردانیان دەكرد، تا كار بەوە گەیشت هاتە سەر ئەوقەناعەتە كە پێویستە بەرهەڵستی ستەم بكرێتو، كاربۆ لادانی خراپە بكرێت ، ئیدی پێی وابوو ئەمەواجبو ئەركی سەرشانی ئەم قۆناغەیەتیو ، بەخاتری ئەمە بەردەوام لەگەڵ شیعەكانی عێراق لە سەر هێڵی پەیوەندی بوو[4]. ئەمەو حوسێنی كوڕی عەلی قەناعەتی تەواوی بۆ دروست بوو و بڕیاری سیاسەتی خۆی لەسەر ئەو فتوایە هەڵچنی كە بۆ بەرەنگاربونەوەی حوكومەتی ئومەوی دابووی، ئەو پێی وابوو كە ئومەویەكان لە حوكمڕانیدا پابەندی سنورەكانی خودا نینو بەپێچەوانەی پەیرەوی پێغەمبەری خودا (ﷺ) و خەلیفە ڕاشیدەكان ڕەفتار دەنوێنن، ئیتر حوسێن خوا لێی ڕازی بێت فتواكەی بەشێوەیەكی ئاڵقەبەندی ئاقڵانەوشەرعیانە دامەزراند، بەم جۆرە: خۆسەپاندنی ئومەویەكانو هەبوونی گومان لەسەر لێوەشاوەییو دادپەروەری یەزید بەیعەتنەدان پێویست دەكەن، فەرمانكردنبەچاكەو

---

١ الفقهاء والخلفاء (ص: ٢٢).

٢ تأريخ الطبري (٦/٢٥٩).

٣ تأريخ الطبري (٦/٣٠٤)، البداية والنهاية (١١/٤٩٤).

٤ تأريخ الطبري (٦/٢٧٣، ٢٧٤).

بەرگرتن لە خراپە لەسەر زانایانی ئۆممەت واجبە، گەورەترین خراپەش حوکومەتی ئومەوی‌وخۆسەپاندنی ئەوانە بەسەر ئۆممەتدا، بەو پێوەرە کە حوسێن بەیعەتی لەگەردندانیە بۆ ئەوان‌و یەکێکە لە کەڵەزاناو سەرەورانی ئۆممەت، کەواتە ئەو بۆ گۆڕینی ئەو خراپەیە لە هەموو کەس لە پێشترە، بەگوێرەی ئەمە هەڵوێستی ئەو بریتی نیە لە دەرچوون لە دژی ئیمام‌و پێشەوای موسڵمانان، بەڵکو بریتیەلە گۆڕینی خراپەو، بەرەنگاربوونەوەی ناهەق‌و، گێڕانەوەی حوکمڕانی بۆ سەر ڕێڕەوە ڕاست‌و دروستە ئیسلامیەکەی[1]. کاتێك حوسێن خۆی بۆ بەرەنگاربوونەوەی یەزید یەکلا کردەوە، بڕیاریدا لە مەککەدا نەمینێتەوە نەبادا حورمەتی ئەم شوێنە پیرۆزە بشکێنرێت‌و بکرێتە گۆڕەپانی کوشتارو ڕژانی خوێن، بێگومان ئەمە بەڵگەیە بۆ حوسێن کە پێداگیربووە لەسەر ئەوە فتواکەی‌و جموجۆڵە سیاسیەکانی لەگەڵ بنەماو ڕێنماکانی ئیسلام بێنەوە، ئەو لە بەرانبەر عبدالله ی کوڕی عباس دا گوتی: ئەگەر لە فلان شوێن‌و فیسارشوێن بکوژرێم بەلامەوە خۆشترە کە لەمککەدا بکوژرێم‌و خوێنمی تێدا حەلاڵ بکرێ[2].

## سێهەم: خۆساغکردنەوەی حوسێن بۆ دەرچوون بەرەو کوفەو، ئامۆژگاری هاوەڵان‌و شوێنکەوتووان بۆی‌و ڕایان لە سەر دەرچوونی:

١- خۆساغکردنەوەی حوسێن بۆ دەرچوون بەرەو کوفە:

دوابەدوای هاتنی نوێنەرو نامە یەك لەسەریەکەکانی سەرانی کوفە بۆ حوسێن- کەداوایان لێ دەکرد بەپەلە بگاتە لایان- ئەمە لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە زۆری شوێنکەوتوانی هانیدا زانیاری لە سەر ڕاستی‌و نێوەڕۆکی بابەتەکە وەربگرێت، بۆ ئەم مەبەستە عوقەیلی کوڕی ئەبو تالیبی ئامۆزای بەرەو کوفە بەڕێکردو، ڕایسپارد هەواڵی ڕاست‌ودروستی لەسەرباروددۆخەکە بۆ بنێرێت، جا ئەگەر زانی ئەوەی دەیڵێن قسەی دڵ‌و دەرونیانە بۆلایان بەڕێ دەکەوێ[3]. موسلیمی کوڕی عوقەیل بەهاوڕێیەتی عبدالرحمن کوڕی عبدالله ی أرحبی‌و قەیسی کوڕی مەسهەری صیداوی‌و، عەمماری کوڕی عوبەیدی سەلولی بەڕێکەوت، کاتێك موسلیم گەیشتە (مەدینە) دوو چاوساغ (دەلیل)ی لەگەڵ خۆبردن، لەم نێوان‌و دەشتی کاکی بەکاکیەدا سەریان لێ تێکچوو ڕێیان بزرکرد، لە ئەنجامدا یەکێك لە دەلیلەکان لە تینوان

---

١ الفقهاء والخلفاء (ص: ٢٣).

٢ تأريخ الكبري، نقلا عن الفقهاء والخلفاء (ص: ٢٥).

٣ تأريخ الطبري (٢٦٧/٦).

بڕشی هەڵات‌و مرد، موسلیم هەستی بەو قورسایی‌و ناڕەحەتیانە کرد کە لە (کوفە)دا ڕووبەڕووی دەبنەوە، بۆیە نامەی بۆ حوسێن نوسی‌و داوای لێ کرد ئەم ئەرکەی لەسەر شان لابەرێ‌و لێی ببورێ، بەڵام حوسێن داواکەی ڕەت کردەوەو فەرمانی پێ کرد درێژە بە ڕۆیشتنەکەی بداو هەرچۆنێك بێ خۆی بگەیەنێتە کوفە[1]. کاتێك (موسلیم) گەیشتە کوفە سەرەتا چووە ماڵی (موختاری کوڕی أبی عبید)[2]، کاتێکیش عبیداللە ی کوڕی زیاد هاتە کوفەو پۆستی ویلایەتی ئەوێی وەرگرت موسلیم لە ترسی ئەوە نەبادا ئاشکرا ببێ بۆ ماڵی (هانئی کوڕی عورِوە)ی گواستەوە، ئەمجا بەحوکمی ئەوە (هانی) یەکێك بوو لە پیاوە ناودارو گەورەکانی کوفەو (عبداللە ی کوڕی زیاد)یش ڕاوێژی پێ دەکرد، (موسلیم) گومانی لێ کردو لەترسی گیانی خۆی، ئەوێشی بەجێ هێشت‌و، لە کۆتامەنزڵیداو بۆ ماوەیەکی کەمخایەن چووە ماڵی (موسلیمی کوڕی عەوسەجەی ئەسەدی)ی کە یەکێك بوو لە بانگخوازانی شیعە[3]. کاتێك خەڵکی کوفە هەواڵی گەیشتنی (موسلیمی کوڕی عەقەیل) یان پێگەیشت، خۆیان گەیاندە لای‌و دوانزە هەزارکەس بەیعەتیان پێدا[4]. ئەم بەیعەتدانە بەشێوەیەکی نهێنی‌و بەو پەڕی ئەسپایی‌و خۆپارێزی یەوە ئەنجام درا، ئیتر (موسلیم) دڵنیا بوو خەڵکی کوفە (حوسێن) یان خۆش دەوێت‌و حەزیان لێیە بەرەولایان بێت،بۆیە بۆ حوسێنی نوسی، پاش ئامە: پێشەنگ درۆ لە گەڵ کەسوکاری خۆی ناکا، هەر هەموو دانیشتوانی کوفە لەگەڵ تۆدان، هەرکە نامەکەت خوێندەوە بەڕێ بکەوە[5]. لێرەدا حوسێن لە ڕاستی‌و دروستی نێتو نیازی دڵو دەرونی خەڵکی کوفە دڵنیا بوو و بۆی دەرکەوت کە هیچ ئیمامێکیان بەسەرەوە نیە – هەروەك پێشتر بۆیان باسکردبوو–[6]. بۆیە لەم حاڵەتەدا دەبێ‌و پێویستە ئەو بەڵێنەیان بۆ بەرێتە سەر کەپێشدا پێی دابوون، لەنامەکەیدا بۆی نوسیبوون: ئەوا براو ئامۆزاو باوەڕپێکراوی نێو بنەماڵەی خۆمم بۆلا ناردن، فەرمانم پێ کردووە بەنامە لە بارو دۆخ‌و کارو بارو بیروڕای ئێوەم ئاگادار بکاتەوە، جا ئەگەر بۆی نوسیم کە هەموو سەرۆك‌و ڕیشسپی‌و ئاقڵمەندو قسەبەدەستەکانتان ڕایان یەکە، چۆن لەپێشدا نوێنەرەکانتان

---

١ تأريخ الطبري (٦/٢٦٧).

٢ تأريخ الطبري (٦/٢٦٧).

٣ تأريخ الطبري (٦/٢٨٣، ٢٨٤).

٤ تهذيب الكمال (٢/٣٠١)، مواقف المعارضة (ص: ٢٣٢).

٥ أنساب الأشراف (٣/٦٧).

٦ تأريخ الطبري (٦/٢٧٢).

ئەمەیان وتبوو و لە نامەکانیشتاندا خوێندبوومەوە، ئەوا إن شاءالله بەرەولاتان دێم[1]. هەرکە حوسێن نامەکەی موسلیمی پێگەیشت‌و خوێندیەوەو بینی داوای لێ دەکا بەرەو کوفە بەڕێ بکەوێت‌و ڕایگەیاندبوو بار لە بارەو ڕێ هەموارە و هەموو لە پێشوازیدا ڕاوەستاون، حوسێنی کوڕی عەلی خۆی ساز کردو بڕیاریدا بەخۆی‌و هەموو کەسوکارو کەسە تایبەتەکانیەوە بەڕێ بکەوێ[2].

٢- هەڵوێستی هاوەڵان‌و شوێنکەوتوان لە بەرانبەر دەرچوونی حوسێن - بۆ کوفە- :

أ- محمدی کوڕی حەنەفیە: کاتێك محمدی کوڕی حەنەفیە هەواڵی بڕیاردانی حوسێنی برای پێگەیشت سەبارەت بەدەرچونی بەرەو کوفە، بەپەلەو بێ دواکەوتن خۆی گەیاندە لای‌و، وتی: برایەکەم تۆ بەلای منەوە خۆشەویستترین‌و عەزیزترین کەسی، کەس لەتۆ لە پێشتروشایانترنیە دڵسۆزی خۆمی بۆ بنوێنم، تا دەتوانی خۆت لە بەیعەتدان بەیەزیدی کوڕی معاویە ببوێرەو مەچۆ نێو شارەکانیشەوە، ئەمجا نوێنەرانی خۆت بەنێو خەڵکدا بڵاو بکەوەو بانگەواز بۆلای خۆت بکە، ئەگەر بەیعەتیان بۆتۆبەست سوپاسی خودای لەسەر بکە، ئەگەر خەڵکیش لەسەر غەیری تۆ کۆبونەوەو بەیعەتیان پێدا، ئەوا خودا بەمە نە لە دینت نە لە عەقڵت کەم ناکاتەوەو، جوامێری‌و مەزنایەتیشت لێ ناسێنێتەوە، من دەترسم خۆ بە یەکێك لەنێو ئەو شارانەدا بکەی‌و، کۆمەڵە خەڵکێك بێنە پێشەوەو، دوبەرەکیان تێ بکەوێ‌و بەرەیەکیان لە گەڵ تۆبێ‌و ئەوەی تریشیان لەدژت بێ، جا بەشەڕ بێن‌و تۆش ببیتە ئامانجی یەکەم سەرە ڕەمب، دەرەنجام چاکترینی ئەم ئوممەتە بەباوك‌و دایکیانەوە بکوژرێن‌و خوێنیان بەهەدەر بڕوات‌و خێزان‌و ڕۆڵەو نەوەشیان - بەدیل بگیرێن‌و- داماو بکرێن، حوسێن ووتی: برای خۆم، بێگومان من دەڕۆم، محمد ووتی: کەواتە لە مەککە نیشتە جێ ببە،ئەگەر لەوێ ئارام بووی‌و بەخۆی گرتی ڕێگا چارەیەکی چاکە، ئەگەر لەوێ هەڵقەنای پەیوەندی بەتەم‌و لمی بیابان‌و لوتکەی چیاکانەوە دەکەی‌و، لەناوچەو شارێکەوە بۆ ناوچەو شارێکی تر دەگوازیەوەو، چاوەڕێ دەکەی سەرەنجامی کارو باری خەڵك بەکوێ دەگات‌و تێ دەگەی چ ڕایەك باشە بیگریە بەر، کاتێك تۆ پێشوازی لە هاتنی سەرەنجام‌و کاروبارەکان دەکەی دەتوانی باشترین ڕا هەڵبژێریت‌و تۆکمەترین کارو چالاکی ڕەچاو بکەی ،ئیدی هەر دەمایەك ڕووت وەرگێڕا شتەکانت لێ تێکەڵ‌و پێکەڵ نابن. حوسێن ووتی: برای خۆم!

[1] تأريخ الطبري (٦/٢٧٤).
[2] تأريخ الطبري (٦/٣٠٥).

دڵسۆزی‌و بەزەیی خۆت بۆ نواندم، هومێدەوارم ڕایەكەت بەجێ بێ[١]. بەگوێرەی ڕیوایەتێكی تر: كاتێك حوسێن بڕیاری خۆی بۆ دەرچوون یەكلاكردەوە، بەدوای نەوەكانی (عبدالمطلب)یدا نارد لەمەدینەو، داوای لێ كردن لەگەڵی دەرچن، ئەوەی لەتوانایدا هەبوو بەدەم بانگەوازەكەیەوە چوو، (محمدی كوڕی حەنەفیە) بە دوایان كەوت، لە مككە گەیشتە حوسێن، پێی ڕاگەیاند كە بڕیاری دەرچون لەم ڕۆژەدا پەسەند نیە، حوسێن ئەم قسەیەی محمدی برای لە دڵ گران بوو، پێی ووت: حەزت لێیە ڕۆڵەكانت لەو شوێنە دوور خەیەوە كەمن تێیدا گیرۆدە دەبم؟، جا محمد ووتی: توشبون‌و لە نێوچوونی تۆ زۆر زۆر گەورەترە لە توشبون‌و لەنێو چوونی ئەوان بەلای ئێمەوە،من چ كارەم كە تۆ توشی موسیبەت بووی با ئەوانیشت لەگەڵ بن![٢].

ب- عبدالله ی كوڕی عەبباس خوا لێی ڕازی بێت .

كاتێك هەواڵی دەرچوونی حوسێن بە عبدالله ی كوڕی عەباسی ئامۆزای گەیشت، عبدالله بەپەلە هاتەلای‌و، ووتی: ئامۆزا گیان! ئەم هەواڵە هەموو خەڵكی ڕاچڵەكاندووە،پێم بڵێ كە تۆ چ دەكەی؟ حوسێن وتی: كاروانم ڕێكخستووەو إنشاء الله لەم یەك دوو ڕۆژەدا بەڕێ دەكەوم، عبدالله وتی: ئەگەر دەزانی دوای ئەوە بانگهێشتیان كردووی كە میرەكەیان كوشتووەو دوژمنەكەتیان دەركردووەو دەستیان بەسەر وڵاتەكەیاندا گرتووە، بۆلایان بڕۆ، بەڵام ئەگەر میرەكەیان لە ژیاندا بێ‌و دەسەڵاتی بەسەریانەوە مابێ‌و، تا ئێستا كاربەڕێوەبەرەكانی لەسەر موچەی وڵاتەكەیان بن، ئەوا بزانە كە ئەوان بۆ ئاژاوەو پشێوی‌و جەنگ‌و كوشتار بانگهێشتیان كردووی، لێت ئارخەیان نیم خەڵكت بەسەر بگێڕن‌و دڵیان لە بەرانبەرتدا بگۆڕن‌و، پاشانیش ئەوانەی بانگهێشتیان كردبی خراپترین‌و توندوتیژترین كەس بن بەرانبەرت. حوسێن وتی: من ئیستخارە دەكەم‌و تەماشا دەكەم چ دەبێ، بەڵام عبدالله لە قسەكانیدا دەركی بەوە كرد كە حوسێن خۆی ساز كردووەو بەجیدی بڕیاری داوە ودەرچێ، بەڵام هەوڵ دەدا شتەكە لەئەو بشارێتەوە، چونكە دەیزانی كە عبدالله لە بەرانبەر ئەمەدا نارەزایە، بۆیە بۆ بەیانی هاتەوەلای‌و، وتی: ئامۆزا ،من ئارامم نەماوە بەڵام زۆر لەخۆم دەكەم دان بەخۆدابگرم، من لەم ڕووە وە مەترسی لە نێوچوونت لێ دەكەم، بزانە كە خەڵكی عێراق بێ بەڵێنن‌و تەفرەیان پێ مەخۆ، لەم وڵاتەدا نیشتە جێ ببە، هەتا كاتێك ئەوان

---

١ أنساب الأشراف (٤/١٥، ١٦).

٢ الطبقات (١/٤٥١)، تحقيق السُلمي.

دوژمنەکەیان وەدەر دەنێن، دوای ئەمە بچۆ، ئەگەر لێرەش نامێنیتەوە – بۆ یەمەن بچۆ – ئەوێ قەڵاو ئەشکەوت‌و شیوی لێن، لایەنگری باوکیشتی لەوێ هەن، خۆت لەخەڵك لاپەڕ بگرە، نامەیان بۆ بنوسەو بانگەواز کەرانی خۆتیان تێدا بڵاوبکەوە، من هومێدەوارم ئەگەر ئەمە بکەی ئەو ئامانجە دەپێکی کەپێت خۆشە. حوسێن وتی: ئامۆزا گیان! بەخودا دەزانم کەتۆ کەسێکی دڵسۆزو بە پەرۆشی، بەڵام من کاروانم ئامادە کردووەو لەسەر هەستە بەڕێ بکەوێ، عبدالله پێی وت: ئەگەر دەڵێی دەبێ هەر بڕۆم، ئەوا ژن‌و منداڵەکانت مەبە، بەخودای گەورە دەترسم کە چۆن (عوسمان) بەبەرچاوی ژن‌و منداڵەکانیەوە کوشتیان، تۆش ئائەوا بکوژرێی،... تا ئەوەی کە وتی: سوێند بەو (الله) یەی کە جگە لەو هیچ پەرستراوێکی ڕاست‌و دروست نین، دەزانم کە بەقسەم ناکەی دەنا دەستم لە کاکۆڵت گیر دەکرد هەتا هەموو خەڵکمان بەسەر دەگەڕاو ئیدی دەستم لێ بەر نەدەدای هەتا بەقسەت دەکردم‌و بڕیارت دەدا لێرە نیشتە جێ بی[1]. بەم جۆرە دەبینین کە عبدالله ی کوڕی عباس هەموو هەوڵێکی خۆی بەگەڕ خست تا قەناعەت بە حوسێن بکات، بەڵام حوسێن لە گەڵ ئەوەدا کە لەلایەن ئەوەوە بۆی ڕون کرایەوە کە ئەویش وەك ئەو بە (یەزید) قایل نیەو گۆڕانی بەلاوە پێویستە،بەڵام هەر قەناعەتی نەهات، دەبینین بۆچوونی عبدالله لە هەموو شتەکاندا لە گەڵ بۆچوونی حوسێن یەك ناگرێتەوە، ئەو لەلایەکەوە هۆکارەکانی شکستخواردنی ڕێی پێکانی ئامانجەکانی بۆ ڕوون دەکاتەوە ، لەلایەکی تریشەوە لە باتی گرتنە بەری ڕێگای دەرچوون بۆ عێراق چەند ڕێگا چارەیەکی تری بۆ دەخاتە ڕوو، کە بەڕای ئەو لەوانەیە ئەمانە لەپێکانی ئامانجەکانی نزیکتر بکەنەوە، بە جۆرێك کە، یەکەم: دەبێ حوسێن چاوەڕوان بێ تا خەڵکی عێراق دەسەڵاتی تەواو بەسەر هەرێمەکەیاندا دەگرن‌و لە ژێر ڕکێفی حوکمڕانی ئومەوی ڕزگار دەکەن، – عبدالله– دەرکی بەو ڕاستیە کردبوو کە ئەوان ئەمەیان پێ ناکرێت‌و (حوسێن) یشیان پێ ناپارێزرێ، دوەم ڕێگا چارە: با حوسێن بەرەو یەمەن بڕوات‌و لەوێ بەگوێرەی ڕێنماییەکانی ئەو ڕەفتار بکا، چونکە بەپێچەوانەی عێراق لەوێ لەلایەکەوە هۆکارەکانی سەرکەوتنی تێدا زیاترن‌و، لەلایەکی تریشەوە هۆکار گەلی شکستخواردنی تێدا کەمترن، لەوانەشە ئیبنو عەباس هیچ کامێك لەمانەی نەویستبن، بەڵکو پێ دەچێ ویستبێتی حوسێن لە هەڵهێنانی ئەم هەنگاوە بەپەلەی بۆ دەرچوون بەرەو عێراق دوابخا، کە بەڕای ئەو هیچ سودێك ناگەیەنێ‌و لە گەڵ گەیشتن بە ئامانجی یەك ناگرێتەوە، خۆ ئەگەر قەناعەت

---

١ الكامل في التأريخ (٢/ ٤٥٦).

بەڕایەکەی ئیبنو عەباس بکات‌و چاوەڕێ بێ تا کاروباری عێراقی بۆ سازو ئامادە دەبێ، یان ڕێگای دەرچوونەکەی بەرەو یەمەن بگۆڕێ، ئەمە کاتێکی زۆر بۆ ڕێکخستنی کارو بارەکان لە عێراق دەدا بەدەستەوە، ئیتر کار بەھەریەکێك لەم دوو خیارە بکات ئەوە لەوانەیە ھۆکاری کات کاریگەری لەسەر ئاسایی کردنەوەی بارو دۆخەکەو کوژاندنەوەی ئاگری ئاژاوەکە دابنێ[1]. قسەکانی ئیبنو عەباس ئەوەیان لێ دەفامرێتەوە کە ئەو لە ڕووی شەرعیەوە لە بەرانبەر دەرچوونی حوسێن لە دژی یەزید ڕای پێچەوانەی نیە، بەلام لەڕووی ستراجییەت‌و چۆنیەتی کارکردنەوە لە گەڵیدا ناکۆکە، ئەو پێی وایە ھەتا حوسێن لە چەندێتی‌و چۆنیەتی ھێزی لایەنگرانی لە عێراق دڵنیا نەبێ‌و، نەزانێ کە ئومەویەکان دەسەلاتیان لە عێراق پێچراوەتەوە نابێ بەرەو عێراق بچێ، ئەگەرنا یەمەن لە دەسەلاتی ئومەویەکانەوە دورەو، ئەویش لەوێ لایەنگرو پشتیوانی زۆرن‌و شوێنی زۆر قایم‌و مەحکەمیشی تێدان تا خۆیان تێدا پەنادا، ھەتا کاتێك دەستی دەڕوا ھێزێکی تەواو لە دژی ئومەویەکان ڕاست دەکاتەوە[2].

ج- عبدالله ی کوڕی عمر خوا لێی ڕازی بێت.

ئەو لەزۆرینەی ھەڵوێستەکانیدا دڵسۆزی‌و پەرۆشی خۆی بۆ حوسێن نواندوەو، ئامۆژکاری کرووە، کاتێك ھەواڵی پێگەیشت عبدالله ی کوڕی زوبێرو حوسێن بەرەو مەککە دەرچوون‌و بەیعەتدان بە یەزیدیان ڕەت کردۆتەوە، خۆی گەیاندنێ‌و، وتی: خوداتان بەگژدادەکەم بگەڕێنەوەو، بچنە نێو ئەو بازنەوە کە بەرژەوەندی خەڵکی- بەگشتی تێدایەو- چاوەڕوان بکەن، ئەگەر ھەموو خەڵك لە سەری یەکدەنگ بوو خۆتان جیا مەکەنەوەو ڕیزپەڕ مەبن، ئەگەر خەڵکیش بەگشتی ڕەفزیان کرد-ئەوا ئەوەیە کە ئێوە دەتانەوێ-و ئامانجتان ھاتۆتەدی[3]. کاتێکیش ھاتە مەدینەو ھەواڵی دەرچوونی حوسێنی بەرەو لای خەڵکی کوفە پێ گەیشت، لەماوەی کاروانە ڕێیەکی دووشەوو ڕۆژەدا خۆی گەیاندە لای‌و پێی گووت: دەتەوێ بەرەو کوێ بڕۆی؟- حوسێن وتی: عێراق- لێرەدا حوسێن چەندین نامەی لوولدراوی عێراقیەکانی لەلابوون، عبدالله ی کوڕی عمر، وتی: بۆلایان مەچۆ. - حوسێن- وتی: ئەمە نامەو بەیعەتنامەکانیانن. عبدالله وتی: خودا پێغەمبەرەکەی لە نێوان دونیاو

---

١ أثر العلماء في الحياة السياسية في الدولة الأموية (ص: ٤٧٥).

٢ الفقهاء والخلفاء (ص: ٢٥).

٣ الطبقات الكبرى، تحقيق السلمي (١/٤٤٤).

دوارۆژ سەرپشك کرد، ئەویش دوارۆژی هەڵبژارد، جەنابتان پارچەیەکن لە ئەو،هەرگیز کەس لە ئێوە بە دەستیەوە ناگرێ، خودا بەخاتری دەستکەوتنی خێرو بێرێکی باشتر ئەو پۆستەی لە ئێوە لاداوە، کەواتە فەرموو بگەڕێنەوە، بەڵام حوسێن نەیسەلماندو بەقسەی نەکرد، جا ئیبنو عمر باوەشی پێدا کردو گەردنی لە گەردنی هاڵاندو ، وتی: بە خودات دەسپێرمو لە پەنای خودادابی‌و نەکوژرێی[١]. عبدالله ی کوڕی عمر دوای ئەمە دەیگوت: حوسێن بەدەرچوونەکەی– بۆ عێراق– بەسەرماندا سەرکەوت، ئەمە لەکاتێکدا ئەو دەیتوانی پەند لە باوکی‌و براکەی وەربگرێ، بەچاوی خۆی بینیبوی کە ئەوان چەندە بەدەست فیتنەو بێ پەیمانی‌و هەڵگەڕانەوەیان هەراسان ببوون، دەبوایە ئەو هەتا لەژیاندا مابایە ڕانەپەڕیبایەو، چوبایە نێو بازنەی ئەو بەرژەوەندیەوە کە خەڵك – بەگشتی چوبوونە نێویەوە– لە ڕاستیدا جەماعەت‌و یەکپارچەیی‌و یەکڕیزی باشترە[٢].

د– عبدالله ی کوڕی زوبێر خوا لێ ڕازی بێت : چەند ڕیوایەتێکی لاواز تۆمەتی دەخەنە پاڵ کە گوایە ئەو یەکێك بوو لە هۆکارەکانی دەرچوونی حوسێن بۆ کوفە، بەڵام بەپێی چەند ڕیوایەتێکی تری صحیح‌و حەسەن– لە خودی عبدالله ی کوڕی زوبێرەوە سابت بووە کە ئەو سەبارەت بە ئەمە دڵسۆزی خۆی بۆ حوسێن خستۆتە ڕوو و، چەند ئامۆژگاریەکی باشیشی کردووەو، لە پاشە ڕۆژی خراپی چونە دەرەوەی لە مەککەو ڕۆیشتنی بەرەو کوفەی ئاگادار کردۆتەوە، بەم چەشنە ئامۆژگاری حوسێنی کردو ، وتی: بەرەو کوفە دەڕۆی؟ بۆلای گەلێك باوکتیان کوشت‌و (حەسەن)ی براتیان بەر نەشتەر دا؟. حوسێن پێی گووت: ئەگەر لە فلانە شوێن‌و فیسار شوێنە بکوژرێم زۆرم بەلاوە خۆشترە لەوە کە لێرە – واتە لە مەککە دا– خوێنم حەڵاڵ بکرێت‌و بڕژێنرێت[٣].

...چەند هاوەڵێکیش بۆ چونیان وابوو کە ئەم کارەی حوسێن دەیکا، لە خودی خۆیدا دەرچونە لەدژی ئیمامی بەیعەت پێدراوو، پێیان وابوو دەرچوونی حوسێن‌و هەموو ئەودەرەنجامانەشی لێی دەکەونەوە بەنەهامەتی‌و شەڕو خراپە بەسەر ئۆممەتدا دەشکێتەوە، ئیتر جیاوازی نیە سەرەنجام بۆ کام لا دەبێ[٤]. لە ڕیزی ئەو هاوەڵانەی ئەم بۆچونەیان هەبوو:

---

١ سير أعلام النبلاء (٣/٢٩٥).

٢ مختصر دمشق (٧/١٣٨).

٣ مصنف إبن أبي شيبة (١٥/٩٥) بسند حسن.

٤ مواقف المعارضة في خلافة يزيد (ص: ٢٣٦).

هـ- أبو سعيد الخدري خوای لێ ڕازی بێت ئەو ، وتی: حوسێن بە دەرچونەکەی بەسەر مندا زاڵ بوو، پێم گووت: لە بەر خاتری خۆت پارێز لە خودا بکە، بەماڵی خۆتەوە پابەند بەو، لە دژی ئیمامت دەرمەچۆ[1].

و- جابری کوڕی عبدالله خوای لێ ڕزای بێت، گوتی: قسەم لە گەڵ حوسێن کردو پێم گوت: پارێز لە خودا بکەو خەڵك بە یەکدا مەدە، بەخودا ستایشتان ناکرێ لە سەر ئەمەی دەیکەن، جا بەقسەی نەکردم[2]. هەروەها لە میانەی بەڕێکەوتنیشیدا لە نێوان ڕێگای (مکە- کوفە)دا هەوڵەکانی ڕاگرتنو کشانەوەی کاروانەکەی حوسێن هەر بەردەوام بوو، بەخاتری ئەمە(عبدالله ی کوڕی جەعفەر) نامەیەکی بۆ نوسی.

ی- عبدالله ی کوڕی جەعفەر خوای لێ ڕازی بێت نا مەکەی نوسیو، بە جوتە کوڕی خۆی (محمدو عەون)دا بەڕێی کرد، نوسیبوی: دوای ئەمە: ئیستا کەتۆ لە ڕێگادای بەڵام توخوا کە تەماشای نامەکەمت کرد- بەقسەم بکە- من لەو ڕووەوە پەرۆشی تۆمە کە ڕێگایەکی وات گرتۆتە بەرو ڕوت لە شوێنێك کردووە لە نێو چوونی خۆتو ڕیشە کێشکردنی بنە ماڵەکەتی تێدایە[3]. بەڵام حوسێن قایل نەبوو بگەڕێتەوە، ئا لێرەدا عبدالله گومانی برد کە پێ دەچێ حوسێن لە ژێر گوشاری (عمروی کوڕی سعیدی کوڕی عاص)ی والی مەدینە دەرچووبێو لەبەر ئەمە بۆ لای (عەمروی کوڕی سەعید) چوو داوای لێکرد نامەیەك بۆ حوسێن بنووسێتو بەڵێنی پێ بدات کە چەپاڵەی دەداتو بە چاکە ڕەفتاری لەگەڵ دەکات. (عەمرو) لە وەڵامدا بە (عبدالله)ی وت: ئەوە نامەی سپیو چیت پێ خۆشە تێیدا بنووسەو دوایی بیهێنە مۆری دەکەم.[4] ئەمەو (عبدالله ی کوڕی جەعفەر) نووسی: بسم الله الرحمن الرحيم، لە عەمروی کوڕی سەعیدەوە بۆ حوسێنی کوڕی عەلی، دوای ئەمە: لە خودا دەپاڕێمەوە لە هەموو ئەو شتانەت لادا کە تووشی کارەساتت دەکەن، بۆ ئەو شتەت هیدایەت بدات کە ڕێنمات دەکات، پێم گەیشت کە تۆ ڕووت لە عێراق کردووە، من بە خوات پەنا دەدەم لە دووبەرەکیو ناکۆکی، دەترسم ئەمە لەنێوچوونی تۆی تێدابێ، ئەوا عبدالله ی کوڕی جەعفەرو یەحیای کوڕی سەعیدم بۆ لا ناردی، تکایە لەگەڵ ئەوان بۆ لای من بێی، بێگومانبە کە بە چەپاڵەدانو چاکەو خزمایەتیو هاوسێباشی پێشوازیت لێ دەکەم، خودا لە بەرانبەر ئەمەدا

[1] تهذيب الكمال (٤٦١/٦)، الطبقات (٤٤٥/١)، تحقيق السلمي.
[2] الطبقات الكبرى (٤٤٥/١)، تحقيق السلمي.
[3] تأريخ الطبري (٣١١/٦).
[4] تأريخ الطبري (٣١١/٦).

شایەدو دەستەبەرو چاودێرو وەکیلە، والسلام علیك.[1] بەڵام حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەم تکایەشی ڕەت کردەوەو درێژەی بە کاروانەکەی دا.

ز- أبو واقد اللیثي (ڕەزای خوای لێ بێت): لە خۆیەوە گێڕدراوەتەوە کە وتوویەتی: هەواڵی دەرچوونی حوسێنم پێ گەیشت، بە نارەحەتی‌و ماندوو مجرۆیی پێی گەیشتم، خودام بە گژدا کرد کە دەرنەچێ، چونکە ڕێڕەوی ئەم دەرچوونەی ناهەمووارەو بەمە تەنها خۆی بە کوشت دەدا، حوسێن لە وەڵامدا وتی: ناگەڕێمەوە.[2]

د- عومرەی کچی عبدالرحمن: نامەیەکی بۆ ناردو تێیدا ئەم کردەیەی ئەوی بە سامناك وەسف کردو، فەرمانی پێکرد بێتە ژێر باری فەرمانبەرداری‌و پابەندبوون بە کۆمەڵی گشتی موسڵمانانەوەو، هەواڵی پێدا کە بەم دەرچوونەی خۆی بەرەو مەرگەسات دەبات.[3]

هـ - أبو بکری کوڕی عبدالرحمن ی کوڕی حارث: پێی وت: ئامۆزاگیان، هەستو سۆزی خزمایەتی‌و سیلەی ڕەحم منی بۆ تۆ خرۆشاندووە، دەنا کوا من ڕێم دەکەوێ ئامۆژگاری تۆ بکەم؟ وتی: ئەی ئەبابەکر تۆ لەو جۆرە کەسانە نی تۆمەتت بخرێتە پاڵ‌و قسەت بە خراپە لێك بدرێتەوە، چیت پێیە بیڵێ، أبوبکر وتی: بۆ خۆت بە چاوی خۆت بینیت کە خەڵکی عێراق چ کارەساتێکیان بەسەر باوکت‌و کاکتدا هێنا، تۆ دەتەوێ بۆ لای ئەوانە بچی کە کۆیلەی دونیان، دەچی تا ئا ئەو کەسەی بەڵێنی پێداوی سەرت بخات جەنگت لەگەڵ بکات‌و، بەڵێنت پێداوە سەری بخەی بەڵام ئەو تووشی شکستت بکات، لەبەر خاتری سەلامەتی خۆت خودات بە گژدا دەکەم ئەمە نەکەی، حوسێن وتی: ئامۆزاگیان خودا پاداشتی چاکەت بداتەوە، خودا بڕیاری لەسەر چ دابێ دەبێ بیهێنێتەدی، جا أبوبکر وتی: إنا لله، دەمانەوێ خودا پاداشتمان بداتەوە لەسەر (ئەبا عەبدیللا).[4]

س- عبداللهی کوڕی مطیع: وتی: بە باوك‌و دایکمەوە بە قوربانت بم! خۆت بۆ ئێمە تەرخان بکە با چێژت لێ وەربگرین، بۆ عێراق مەچۆ، سوێند بێ بە خوا ئەگەر ئەو تاقمە بتکوژن دوای ئەوە ئێمەش دەکەن بە نۆکەرو کۆیلەی خۆیان.[5]

---

١ مختصر تأريخ دمشق (١٣٩/٧).

٢ المصدر نفسه (١٤٠/٧).

٣ تأريخ الطبري (٣١٢/٦).

٤ البداية والنهاية (٥٠٤/١١).

٥ مختصر تأريخ دمشق (١٣٩/٧).

ش- سعیدی کوڕی مسیب: (الذهبي) لێیەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: ئەگەر حوسێن دەرنەچووبایە بۆ خۆی باشتر بوو.[1]

ك- عەمرووی کوڕی سعیدی کوڕی عاص: لە نامەیەکیدا بۆی نوسیبوو: من داوا لە خودا دەکەم سەرڕاست‌و ڕێنمات بکات‌و لەو چۆرتم‌و ناهەموارییانەت لادا کە لە ڕێتدان‌و تووشی لەنێوچوونت دەکەن. هەواڵم پێگەیشتووە کە بڕیارت داوە کاروانت بەرەو عێراق بەڕێ بخەی، من بە خودات پەنا دەدەم لە دووبەرەکی‌و ناکۆکی.[2]

و- الفرزدق: لە الصّفاح[3] پێی گەیشت، حوسێن پرسیاری لێکرد کە چی لە پشتەوە هەیە، فەرزدەق وتی: تۆ بە لای خەڵکەوە لە هەموو کەس خۆشەویستتری، بڕیار لە ئاسمانەو، شمشێرەکانیش لەگەڵ نەوەکانی (ئومەییە)ن،[4] بە گوێرەی گێڕانەوەیەکی تر وتی: پێم وت: ئەوانە-ی بانگهێشتیان کردووی- تووشی شکستت دەکەن، کەواتە بۆ لایان مەڕۆ، بەڵام بە گوێی نەکردم.[5]

ئەمە وتەو هەڵوێستی هاوەڵان‌و شوێنکەوتووان بوون سەبارەت بە دەرچوونی حوسێن، فەلسەفەو حیکمەتی ئەوان بوو لە بەرانبەر ئەم مەسەلە گرنگەدا، ئەوان لەبەر ئەوە بەیعەتیان بە یەزید نەدابوو کە پێیان وابووبێ لە هەموو هاوەڵان‌و شوێنکەوتووان باش‌و شکۆدارتر بووبێ، نەخێر بۆیە ئەمەیان کردبوو تا ڕێ بە خراپەیەکی گەورەتر بگرن‌و دەروازەکانی پەرتەوازەو ناکۆکی‌و دووبەرەکی لەسەر ئوممەتی ئیسلامی داخەن، بەڵگەمان بۆ ئەمە: (خليفة بن خياط وإبن سعد) لە داودی کوڕی عبدالله ی کوڕی ئودی‌و لە حمیدی کوڕی عبدالرحمن ڕیوایەت دەکەن کە وتی: کاتێك یەزید کرایە خەلیفە سەردانی یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خودا (ﷺ)مان کرد، وتی: لەوانەیە ئێوە بڵێن: خۆ یەزید لەنێو ئوممەتی محمددا نە باشترین کەسەو نە زاناترین زانایەو نە پایەدارترین کەسایەتییە. وتمان: بەڵێ ئێمە وادەڵێین، وتی: منیش ئەمە دەڵێم، بەڵام وەڵڵاهی ئەگەر ئوممەتی محمد کۆك‌و

١ سير أعلام النبلاء (٣/٢٩٦).

٢ تأريخ دمشق (١٤/٢٠٩)، أحداث وأحاديث فتنة الهرج (ص: ٢١٢).

٣ شوێنێکە کەوتۆتە نێوان (حونەین‌و ئەنصابی حەرەم) کە لە (مشاش)ەوەو بە لای چەپەوە داخڵی مەککە دەبی.

٤ مختصر تأريخ دمشق (٧/١٤٤).

٥ تأريخ دمشق (١٤/٢١٤).

یەکپارچە بێ پێم خۆشترە لەوە پەرتەوازەو ڕاجیا بێ، پێم بڵێن، ئەگەر دەروازەیەك ئەوەندە فراوان بێ‌و هەموو ئوممەتی محمدی پێدا بچێتە ژوورەوە، ئایا نارەحەتە بۆ یەکێك بڵێ ناتوانم پێیدا بچمە ژوورەوە؟ وتمان: نەخێر (نارەحەت نیە)، وتی: پێم بڵێن ئەگەر هەر یەکێك لە ئەندامانی ئوممەتی محمد بێتو بڵێ: خوێنی براکەم ناڕێژم، ماڵی لێ زەوت ناکەم، ئایا ئەم بازنەیە بە خۆیان ناگرێ؟ وتمان: بەڵێ، وتی: ئەمە ئەو ڕاستیەیە کە بە ئێوەی دەڵێم.[1] وەك تێبینی دەکرێ هەموو لایەك (لە هاوەڵان‌و شوێنکەوتووان) بە ئەوانەشیانەوە کە ڕەفزکردنی بەیعەتەکەی یەزیدی بە لاوە دروست بووە، لەسەر ئامۆژگاری کردن‌و ڕێنمایی حوسێن بۆ دەرنەچوون بۆ عێراق یەکدەنگ‌و کۆڕا بوون‌و پێیان وابووە کە نابێ متمانە بە خەڵکی کوفە بکات، میسوەری کوڕی مەخرەمە (خوا لێی ڕازی بێت) نامەیەکی بۆ حوسێن ناردو پێی وت: کە نابێ بە نامەکانی خەڵکی عێراق تەفرە بخوات‌و ئامۆژگاری کردبوو کە حەرەم(ی مەککە) بەجێ نەهێڵێت، خۆ ئەگەر ئەوان (واتە کوفەییەکان) پێویستیان بە ئەو بێ ئەوا ئەوان ئەستۆی وشترەکانیان دەشکێنن‌و بە پەلە خۆی دەگەیەننێ، ئەو کات بەوپەڕی هێزو ژمارەی زۆرەوە دەتوانێ دەربچێت.[2] لەگەڵ ئەمەدا کە دەبینین ئامۆژگاریکەرانی حوسێن ڕایان لەسەر ناپاکی خەڵکی کوفە یەکدەنگەو بە پێویستی دەزانن کە نابێ متمانە بە بەڵێنەکانیان بکرێ، لە هەمان کاتیشدا دەبینین کە پێشبینی هەموویان لەسەر کوژرانی حوسێن یەکدەگرێتەوە، ئەمە لە ئەوەدا دەردەکەوێ کە هەموویان داخ‌و خەفەت بەو دەرچوونەی دەخۆن‌و بە چەند وشەیەکی پەرۆشاوی خوداحافیزەی لێ دەکەن، بێگومان ئەمە بەڵگەیە بۆ ئاستی زانیاری‌و چاکخوێندنەوەی ئەو ئامۆژگاریکەرە زانایانە بۆ بارودۆخەکان‌و، چاکتێگەیشتنیان‌و وەرگرتنی ئەزموونی تەواو لەو ڕووداوانەی پێشدا کە لە میانەی ئاشووبەکەی نێوان عەلی‌و معاویەدا هاتبوونە ئاراوە، لەو میانەیەدا ئەزموونیان لەسەر خەڵکانێك وەرگرتبوو کە چۆن بە پاڵنەری جۆراوجۆر ویستوویانە لە ڕێی هەڵایساندنی ئاگری ئاشوب‌و ئاژاوە بە سوودی تایبەتی خۆیان بکەن.[3]

---

١ الطبقات (١٤٧/٧)، تأريخ خليفة (ص: ١٦٤).

٢ مختصر تأريخ دمشق (١٤٠/٧).

٣ أثر العلماء في الحياة السياسية (ص: ٤٨١).

## چوارەم: هەڵوێستی یەزید لە بەرانبەر ڕووداوەکانی کوفەدا:

کاتێك یەزید دڵنیا بوو حوسێن بڕیاری خۆی یەکلاکردۆتەوەو وەڵامی بانگهێشتەکەی خەڵکی کوفەی داوەتەوە، نامەیەکی بۆ عبداللە ی کوڕی عەباس–ی براگەورەی ئەو سەردەمەی بەنی هاشمو کەڵەزانای موسڵمانان– ناردو بۆی نوسیبوو: پێمان وایە چەند کەسێك لە خۆرهەڵاتەوە هاتوونەتە لایو بەڵێنی پۆستی خیلافەتیان پێداوە، بێگومان جەنابت ئەزموونی تەواوت لەسەر ئەوان هەیە، ئەگەر (حوسێن) ئەمە بکاتو–بە قسەی ئەوان بکات– ئەوا پەتی پەیوەندی خزمایەتی (واتە صیلەی ڕەحمی) پساندوەو، ئەمە لە حاڵەتێکدا کە جەنابت براگەورەو سەرپەرشتیاری بنەماڵەکەیەتی، –کەواتە هەموو هەوڵی خۆت تەرخان بکەو– وازی پێ لە جوداخوازی بێنە.[١] ئەمجا (یەزید) ئەم چەند کۆپلە شیعرەی بۆ (عبداللەی کوڕی عەباس)و دانیشتوانی مەککەو مەدینەو هۆزی قورەیش بەڕێ کرد:

| | |
|---|---|
| يـا أيهـــا الراكب الغـادي لطيته | على عذافـرة في سـيرها قحـم |
| أبلـغ قريشـا على نأي المزار بها | بيني وبين حسـين الله والرحـم |
| وموقف بفنـاء البيـت ينشـده | عهد الإلـه ومـا تـوفى به الذمم |
| غنيتـم قومكم فخـرا بـأمكـم | أم لعمري حصـان بـرة كـرم |
| هـي التـي لا يداني فضلهـا أحد | بنت الرسول وخير الناس قد علموا |
| وفضـلها لكم فضـل وغـيركم | من يومكم لهم في فضلهـا قسـم |
| إني لأعلـم حقـا غـير مـا كذب | والطرف يصـدق أحيانا ويقتصـم |
| إن سـوف يدرككـم مـا تدعون بها | قتلى تهـاداكـم العقبان والرخـم |
| يا قومنا ! لا تشبوا الحرب إذ سكنت | تمسكـوا بحبال الخير واعتصـموا |
| قد غرت الحرب من قـد كـان قبلكم | مـن القرون وقد بادت بهـا الأمم |
| فـانصفوا قومكـم لا تهلكوا بذخـا | فـرب ذي بـذخ زلـت بـه القدم[٢] |

(عبداللەی کوڕی عەباس)یش بە نۆبەی خۆی بۆی نوسیەوە: ئومێدەوارم دەرچوونی حوسێن بۆ شتێك نەبێ بە نیگەرانی تۆ تەواو بێ، هەتا بتوانم واز لە ئامۆژگاریکردنی ئەو و یەکخستنەوەی دڵەکانو کپکردنەوەی ڕقی هەستاو ناهێنم.[٣]

---

١ تهذيب الكمال (٦/٤١٩)، مواقف المعارضة (ص: ٢٤٣).

٢ البداية والنهاية (١١/٥٠٥).

٣ سير أعلام النبلاء (٣/٣٠٤)، مواقف المعارضة (ص: ٣٤٤).

لەم کاتەدا ڕووداوەکان پێش یەکتریان دەدایەوە، بە تایبەتی دوای ئەوە کە شیعەکان لەسەر بەیعەتدان بە موسلیمی کوڕی عوقەیل جیاوازییان تێکەوت، کاتێك (نوعمانی کوڕی بەشیری ئەنصاری)ی والی کوفە هەستی بە ترسناکی باروދۆخەکە کرد خەڵکی کۆکردەوەو لە وتارێکیدا کە ئاراستەی کردن، وتی: ئەی بەندەکانی خودا پارێز لە خودا بکەن‌و بەرەو ئاشوب‌و پەرتەوازەیی هەنگاو مەنێن، چونکە تێیدا پیاوگەل دەکوژرێن‌و خوێن دەڕژێت‌و سامان داگیردەکرێت، هەروەها وتی: من کەسێك ناکوژم شەڕم پێ نەفرۆشێت، هەڵناکوتمە سەر کەسێك هەتا پەلامارم نەدا، نە جنێوتان پێ دەڵێم نە ڕاوەدووتان دەنێم، بە گومان‌و تۆمەتیش کەس ناگرم، بەڵام ئەگەر بە ڕاشکاوانە ڕووی دوژمنکارانەی خۆتانم نیشان دەن‌و بەیعەتەکەتان هەڵوەشاندەوەو، سەرپێچی ئیمامەکەتان (واتە یەزید) کرد، ئەوا سوێند بەو خوایەی کە جگە لە خۆی هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە، ئەوا بە تاکی تەنیاو ئەگەر یەك پشتیوانیشم بە دەستەوە نەبێ هەتا دەستم شمشێر بگرێ بە شمشێر لە گەردنتان دەدەم، بەڵام ئومێدەوارم ئەوانەتان کە هەق‌و ڕاستی دەناسن زۆر لەوانەتان زیاتر بن کە ناهەق بە لای خۆیدا ڕەتاندونی.[1] لێرەدا دەرك دەکرێ کە سیاسەتەکەی نوعمانی کوڕی بەشیر (ڕەزای خوای لێ بێت) وێڕای لایەنگرانی حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) ئاماژە بۆ پارێزەرو هەوادارانی دەوڵەتی ئومەویش دەکات، (عبداللە ی کوڕی موسلیمی کوڕی سەعیدی حەزرەمی) یەکێك بوو لە پیاوو هاوپەیمانانی (بەنی ئومەییە)، لە بەرانبەر نوعمانی کوڕی بەشیر ڕاست بۆوەو بۆی ڕوون کردەوە، کە ئەم سیاسەت‌و شێوازەی ئەو گرتوویەتیە بەر ڕێبازی خەڵکانێکە کە دەستەپاچەو لاوازن، بۆیە پێویستە لەسەری سیاسەتی هێزو لێدان بگرێتە بەر لە بەرانبەر هەموو ئەو کەس‌و گروهانەی لە بۆسەدان تا هێمنایەتی کوفە بخەنە خەتەرەوە، بەڵام نوعمانی کوڕی بەشیر (ڕەزای خوای لێ بێت) بەرپەرچی دایەوەو ڕایگەیاند کە ئەو لە سیاسەتەکەیدا خودای گەورەی کردۆتە چاودێر بەسەر خۆیەوە.[2]

یەزید ئەم سیاسەتەی نوعمانی بە دڵ نەبوو، بۆیە لەسەر پۆستی ویلایەتی کوفەی لاداو، (عوبەیدوڵلای کوڕی زیاد)ی لەجێ داناو، لە نامەیەکیدا کە بۆ ئەم ئەرکە ئاراستەی کرد پێی وت: لایەنگرانی خۆم لە دانیشتوانی کوفە بە نامە هەواڵیان پێ داوم، کە (موسلیمی کوڕی عوقەیل) لە کوفەدا بە مەبەستی درزخستنە نێو ڕیزی موسڵمانان خەریکی گەلەکۆمەیە، هەر

---

١ تأريخ الطبري (٦/٢٧٧).
٢ تأريخ الطبري (٦/٢٧٧).

کە نامەکەمت خوێندەوە بە پەلە خۆت دەگەیەنیە کوفەو، کون بە کون لە (موسلیم) دەگەڕێی، هەتا نەیگریو نەیبەستیەوە، یان نەیکوژی، یان نەفی نەکەی وازناهێنی، والسلام.[1] ئەمەو عبیداللە ی کوڕی زیاد پاش دانانی عوسمانی کوڕی زیاد لە باتی خۆی بەسەر (بصرە)وەو، ڕەچاوکردنی چەند ڕێو شوێنێك لە ترسی سەرهەڵدانی پشێوی لەو شارەدا،[2] بە هاوڕێیەتی چەندین کەسایەتی (بەصرە) لە وێنەی (موسلیمی کوڕی عەمروی باهیلیو شەریکی کوڕی ئەعوەڕی حارثیو خاووخێزانو کەسوکاری خۆی بەصرەی بەجێ هێشت،[3] ئیبنوزیاد بەرەو کوفە بەڕێ کەوتو بە دەمامککراوی خۆی پێداکرد، خەڵك کە چاوەڕوانی هاتنی حوسێنیان دەکرد، گومانیان برد کە ئەمە حوسێنەو گەیشتووە، بۆیە بە نێو خەڵکدا بڵاوبۆوە کە حوسێن هات، ئەمەو عوبەیدوڵلا بە لای هەر خەڵکێکدا ڕادەبووری، سەلامیان لێ دەکردو دەیانوت: مەرحەبا ئەی کوڕی پێغەمبەری خودا، یاخوا بەخێر بێی، خێرو خۆشیت هێنا ئەی قەدەم خێر، کاتێك کە خەڵك زۆریان هێنا، موسلیمی کوڕی عەمرو هاواری کردو وتی: بچنە دوایە ئەمە عوبەیدوڵلای کوڕی زیادی ئەمیرە، کە گەیشتە نێو کۆشکەوە، بۆ نوێژی جەماعەت بانگ درا، خەڵك کۆبۆوە، جا هاتە دەرەوەو وتارێکی بۆ خوێندنەوە، بەڵێنی پێدان هەر کەسێك گوێڕایەڵو فەرمانبەردار بێ بە چاکە ڕەفتاری لەگەڵ بنوێنێو، هەڕەشەشی کرد ئەگەر هەر کەسێك هەوڵی ئاژاوە بدا بە زەبروزەنگ و جەنگ وەلامی دەداتەوە.[4]

## پێنجەم: عبیداللە ی کوڕی زیادو هەنگاوەکانی بۆ کۆتایی هێنان بە موسلیمی کوڕی عوقەیلو پشتیوانانی:

١- خۆخستنەنێو ڕێکخستنەکەی (موسلیمی کوڕی عوقەیل)ەوە:

عبیداللە ی کوڕی زیاد هەوڵی دەدا لە ڕێی سیخوڕەکانیەوە زانیاری لەسەر گروهە نەیارەکانی کۆبکاتەوە، هەر لەم ڕێیەوە توانی خۆ بەنێو ڕێکخستنی شوێنکەوتووانی موسلیمی کوڕی عوقەیلدا بکات، یەکێك لە پیاوەکانی بۆ ئەنجامدانی ئەم ئەرکە ڕاسپاردو بڕێك پارەی پێ دا، ئەم پیاوە کە خەڵکی شام بوو، ناوی (معقل) بوو، ئەندازەی پارەکەش

١ تأريخ الطبري (٦/٢٧٨).
٢ تأريخ الطبري (٦/٢٧٩).
٣ تأريخ الطبري (٦/٢٧٩).
٤ تأريخ الطبري (٦/٢٨٠).

سێ هەزار درهەم بوو، (عبيدالله) پێی وت: ئەم پارە بگرەو دەرچۆو بە شوێن موسلیمی کوڕی عوقەیل دا بگەڕێ، بەوپەڕی ئامادەباشی و ئەسپایی و لەسەر هەست بۆی بچۆو بیدۆزەوە، کابرا دەرچوو و خۆی گەیاندە مزگەوتی گەورە، تەماشای کرد پیاوێك لە پەنا یەکێك لە پایەکانی مزگەوت بەردەوام خەریکی نوێژە، چاوەڕێی کرد هەتا کابرای نوێژخوێن کۆتایی بە نوێژ هێنا، خۆی لێ نزیك کردەوەو لە تەنیشتیەوە دانیشت، وتی: بە ساقەت بم من بابایەکی شامیم و نۆکەری تیرەی (ذي الكلاع)م، خودا بە نازو نیعمەتی خۆشویستنی ئالوبەیتی پێغەمبەری خودا (ﷺ)و خۆشویستنی ئەوانەی ئەوانیان خۆش دەوێ ئاوڕی بە خێری لێ داومەوە، ئەم سێ هەزار درهەمەم لە لایە، حەز دەکەم بیگەیەنم بە یەکێك لە ئەندامانی ئالوبەیت، هەواڵم پێگەیشتووە کە یەکێك لە ئەوان هاتۆتە ئێرەو بانگەواز بۆ لای حوسێن دەکات، ئایا دەتوانی پێم بڵێی لە کوێیە تا ئەم پارەی پێ بدەم؟، بەڵکو بتوانێ هەندێ کاروباری خۆی پێ ڕاپەڕێنی و بیدا بە هەر کەسێك بۆ خۆی حەزی لێیە بیداتێ لە لایەنگرانی؟، بابای نوێژخوێن پێی وت: بۆ لەنێو هەموو خەڵکی نێو ئەو مزگەوتە هاتویی و بەمن دەڵێی؟. وتی: چونکە لە دەموچاوو سیماتەوە خێرم خوێندۆتەوەو، گەشبین بووم بەوە کە تۆ یەکێکی لە ڕیزی ئەوکەسانەی ئالوبەیتی پێغەمبەری خودایان خۆش دەوێ‌و لایەنگریان لێ دەکەن. کابرا وتی : وەیش! چۆن بەسۆمای چاوەکانت منت دۆزیوەتەوە، من یەکێکم لە براکانت، ناوم موسلیمی کوڕی عەوسەجەیە، پێشدا لێت ترسام، بەڵام ئێستا خۆشحاڵم بە بینینت، من یەکێکم لە شیعەو لایەنگرانی ئالوبەیت، بەڵام لە ترسی ئیبنوزیادی ملهوڕ دەبێ لە سەردەستی خودا پەیمانم پێ بدەی و سوێندم بۆ خۆی کە ئەمە لە لای کەس نەدرکێنی، ئەویش چی ویست و چۆنی داواکرد ئاوا پەیمانی پێداو سوێندی بۆ خوارد، دەرەنجام بابای شامی توانی خۆی بگەیەنێتە موسلیمی کوڕی عوقەیل، ئیتر هەموو ڕۆژێك بە بێ بەربەست سەردانی دەکردو بێ پەردە چاوی پێ دەکەوت، هەر لە بەیانیەوە تا ئێوارە لای ئەو دەبوو، لە تەواوی دەنگ و باسیان حاڵی دەبوو، کە ئێوارە دادەهات و شەو تاریك دەبوو، بۆ لای عبیدالله ی کوڕی زیاد دەگەڕایەوەو هەموو قسەو باس و هەواڵی ئەوانی لە نوکەوە بۆ دەگێڕانەوە، دەیگوت: ئەمەیان دەگوت و ئەمەشیان دەکردو، پێی ڕاگەیاند کە موسلیمی کوڕی عوقەیل لە ماڵی هانیئی کوڕی عوروە پەنای گرتووە[1]. بەم چەشنە

[1] الأخبار الطوال (ص: ٢١٨)، تأريخ الطبري (٦/٢٨٤).

عوبەیدوڵلای کوڕی زیاد توانی زانیاری لە سەر هەواڵ‌و چالاکیەکانی موسلمیی کوڕی عوقەیل وەربگرێ[١].

٢ـ بەند کردنی هانیئی کوڕی عورِوە:

محمدی کوڕی ئەشعەث‌و ئەسمائی کوڕی خاریجە سەردانی عبیداللە ی کوڕی زیاد یان کرد، پێی وتن: هانیئی کوڕی عورِوە بەچیەوە خەریکە؟ گوتیان: جەنابی ئەمیر ئەو ماوەی چەند ڕۆژێکە نەخۆشە. عوبەیدوڵلا گوتی: چۆن شتی وایە، ئاگادارم کە تەواوی ڕۆژ لە بەردەرگای ماڵەکەی دادەنیشێ، چ شتێك وای لێ کردوە بۆ لامان نایات تا سەلامێکمان لێ بکات‌و بەخێراتنمان بکا؟! گوتیان: ئاگاداری دەکەینەوە، پێی ڕادەگەیەنین کە بۆ تا ئێستا نەهاتۆتەلات. ئیتر لەلای دەرچوونو، بەرەو ماڵی هانی ڕۆیشتن، عوبەیدوڵلا چی وتبوو ئەوانیش چیان وتبوو هەموویان بۆ گێڕایەوە، ئەمجا پێیان وت: بەخوا دەبێ ئێستا لە گەڵمان بێی، بەڵکو ڕقو کینەی دەرونی دامرکێتەوە، ئەویش بانگی کرد وڵاخەکەی بۆ بێنن، سواری بوو و لە گەڵیان ڕۆیشت، لە کۆشکی ئیمارە نزیك بوونەوەو دڵودەروونی ڕاچڵەکا، پێی گوتن: دڵم لەو کابرایە دەترسێ، گوتیان: کە تۆ پاك بی دەبێ باك بی، بۆچی لە خۆتەوە مەترسی لە خۆت دەکەی؟ ئیدی لە گەڵیان ڕۆیشت هەتا گەیشتنە لای ، عوبەیدوڵلا بە خوێندنەوەی ئەم کۆپلە شیعرە پێشوازی لە هاتنی هانی کرد :

أريد حَياتَه ويُريد قَتلِي عَذيرَكَ من خَلِيلك من مُرادِ

هانی وتی: ئەمە یانی چی جەنابی ئەمیر؟ ئیبنوزیاد گوتی: چ شتێك لەوە گەورەترە؟موسلیمی کوڕی عوقەیلت هێناوەتە ئێرەو لە ماڵی خۆت پەنات داوەو خەڵکی بۆ لا بانگهێشت دەکەی هەتا بەیعەتی پێ بدەن؟ هانی وتی: نە ئەوەم کردووە، نە دەربارەی ئەمەش هیچ دەزانم.

ئیبنوزیاد بە پیاوێکی خۆی وت کابرای شامی واتە (معقل)م بۆ بانگ بکە، کە گەیشت، ئیبنوزیاد ڕووی لە هانی کردو پێی وت: ئەم پیاوە دەناسی؟ کە تەماشای کرد، زانی ئەمە بەسەریانەوە جاسوس بووە، هانی وتی: جەنابی ئەمیر، بە خوا ڕاستیم پێ وتووی، بە خوا من نە بانگهێشتی موسلیمم کردووەو نە هەستم (بە هاتنیشی کردووە) ئەمجا بەسەرهاتەکەی کتومت وەکو خۆی بۆ گێڕایەوەو وتی: من لە ماڵەکەی خۆمی دەردەکەم، بە ئارەزووی خۆی بۆ کوێ دەچێ با بچێ، ڕێگەم پێ بدە دەربچم ئەمە بکەم‌و پەیمانی پیاوان بێ بۆ لات

١ تأريخ الطبري (٢٨٤/٦).

دێمەوە. ئیبنوزیاد وتی: نە بە خوا، هەتا بۆ ئێرەی نەهێنی نایەڵم لێم جیا بیتەوە. هانی وتی: ئەوە جوانەو لە من دەوەشێتەوە میوان‌و پەنادراوی خۆمت بۆ کوشتن ڕادەست بکەم؟! وەڵلاهی قەت ئەمە ناکەم، ئیبنو زیاد بە دار حەیزەرانەکەی دەستی ڕووبەڕووی بۆوەو بە دەم‌و چاوی ڕاکێشاو لووتی شکاندو سەرو بڕۆی بریندار کردو فەرمانیدا بیخەنە نێو ماڵێکەوەو (بەندی بکەن).[1] هەواڵ بە (عەمروی کوڕی حەجاجی زوبێدی) گەیشت کە هانی کوژراوە، بە خۆی‌و پیاوانی تیرەی (مذحج)ەوە هات‌و، گەمارۆی کۆشکی ئیمارەی دا، بانگەوازی کرد کە ئەو لە فەرمانبەرداری دەرنەچووە، بەڵکو دەیەوێ لە ساغ‌و سەلامەتی هانی دڵنیا بێ، ئیبنوزیاد فەرمانی بە (قازی شوڕەیح) کرد بۆ لای هانی بچێت‌و بە تەواوەتی تەماشای بکات‌و هەواڵی زیندوێتی ئەویان پێ ڕابگەیەنێ، ئەویش ئەمەی کرد.[2] ئەمجا (عەمروی کوڕی حەجاج)ی سەرۆکیان پێی وتن کەواتە ئەگەر هاوەڵەکەتان زیندوو بێ چیتان لە ئاشوب‌و پشێوی نانەوە داوە؟ ڕووتان وەرگێڕن‌و بگەڕێنەوە.

٣ــ عوبەیدوڵلای کوڕی زیادو بەکارهێنانی پیاوماقوڵانی کوفە بۆ کۆتایی هێنان بە شۆڕش‌و هەڵگەڕانەوە لەنێو شارەکەیاندا:

کاتێك (موسلیمی کوڕی عوقەیل) هەواڵی شکاندنی سەرو سوڕەتی هانیئی عوروەی لە لایەن عوبەیدوڵلای کوڕی زیادەوە پێگەیشت، فەرمانی کرد بانگی هەموو ئەو هاوەڵانەی بکرێ کە بەیعەتیان پێداوە، بۆ ئەمە وشە نهێنییەکەی بەکارهێنا کە بریتی بوو لە (یا منصور أمت)، ئەمەو لایەنگرە کوفەییەکانی کە خۆیان لە چوار هەزار پیاو دەدا لە دەورەی کۆبوونەوە،[3] عوبەیدوڵلای کوڕی عەمروی کوڕی عەزیزی کیندی کردە سەردەستەی پیاوانی تیرەی کیندەو ڕەبیعەو، فەرمانی پێکرد بە سواری ئەسپ لە پێش خۆی (واتە موسلیم)ەوە بڕوات، (موسلیمی کوڕی عەوسەجەی ئەسەدی)یشی کردە فەرماندەی پیاوانی تیرەکانی مەذجەح‌و ئەسەدو، فەرمانی پێکرد بە پیادە بڕۆن، (ثومامەی صائیدی)یشی کردە فەرماندەی پیاوانی هەردوو تیرەی تەمیم‌و هەمەدان، (عەباسی کوڕی جەعدەی جەدەلی)یشی کردە سەردەستەی پیاوانی (مەدینە)، ئەمجا بەرەو کۆشکی ئیمارە بەڕێ کەوت، کاتێك عوبەیدوڵلای کوڕی زیاد هەواڵی بەڕێکەوتنی (موسلیم)ی پێگەیشت، لە کۆشکدا خۆی

---

١ الأخبار الطوال (ص: ٢١٩)، تأريخ الطبري (٢٨٨/٦).
٢ الأخبار الطوال (ص: ٢١٩).
٣ تأريخ الطبري (٢٨٩/٦).

مەلاسدا،[١] عوبەیدوڵڵا هەتا بلێی فێڵبازو زۆرزان‌و زرنگ بوو، هەر لەگەڵ گەیشتە نێو کۆشک سەران‌و قسەبەدەستانی خەڵکی کوفەی کۆکردنەوەو بە خاتری ئەوە لەم گەمەیەدا بیانکاتە وەرەقەی گوشارو لە کاتی پێویستدا بەکاریان بێنێت‌و بەرژەوەندی خۆیان پێ مسۆگەر بکات وەکو بارمتە لە لای خۆی دانیشاندن‌و نەیهێشت هیچ کامێك لە ئەوان بڕواتە دەرەوە،[٢] موسلیم بە خۆی‌و ئەو هێزە زۆرەوە بەرەو ئەو کۆشکی ئیمارەتە بەڕێ کەوت کە ئیبنوزیاد خۆی تێدا قایم کردبوو، ئالێرەدا ئیبنوزیاد داوای لەو پیاوماقوڵ‌و سەرانەی کوفە کرد کە بە لای خۆیەوە بوون ئامۆژگاری خەڵکی ڕاپەڕیو بکەن‌و تێیان بگەیەنن کە خەڵکی شام بۆیان بەڕێوەیەو، بەم شێوەیە بیانترسێنن‌و دەرەنجام تووشی بەزین‌و کۆڵدانیان بکەن، بەم چەشنە ئەو سەرۆك‌و پیاوماقوڵانەی کوفە خەڵکیان سارد دەکردەوەو ئاشتی‌و ساغ‌و سەلامەتی‌و هێمنایەتیان بەگوێ دادەدان‌و پێیان دەوتن : ئەگەر واز لەم هەڵگەڕانەوەیان نەهێنن ئەوا موچەکەیان لێ دەبڕدرێت‌و بەرەو سەنگەرەکانی پێشەوە دەبرێن‌و سزای توند چاوەڕێیان دەکات.[٣] ئەم ساردکردنەوەو تەکاندنەوە تەنها لەسەر سەرۆك‌و پیاوماقوڵەکان کورت هەڵنەهاتبوو، بەڵکو ژنانی شار ڕۆڵێکی گەورەو کاریگەریان گێڕا لە ڕوخاندنی وورەو ئازایەتی پشتیوانانی موسلیم، زیاد لەمەش باوکان‌و پیرو بە ساڵاچووەکان هەمان ڕۆڵیان دەگێڕا، ژن دەچووە لای کوڕەکەی یان برایەکەی‌و پێی دەوت: جیا بەوە ئەو خەڵکە زۆرە لە بری تۆش دەکەون، پیاو دەچووە لای کوڕەکەی یان برایەکەی پێی دەوت: بەیانی خەڵکی شام دەگەنەجێ، ئەو کاتە بە جەنگ‌و شەڕ چت پێ دەکرێ‌و چت دێتە دەست؟ دەی وازبێنە.[٤] ئا ئەم جەنگە ساردە (دەروونیە) کە خۆی لە ترس‌و تۆقاندن‌و هەڕەشەی پێشوەختدا دەبینیەوەو لە بەرانبەر لایەنگرانی (موسلیمی کوڕی عوقەیل) هەڵگیرسێنرابوو، کاریگەری لەنێو ڕیزی ئاپۆرای خەڵك دروست کردبوو، وای لێ کردبوون بە فیعلی بچنە نێویانەوەو کوڕو برای خۆیانی لێ بتەکێننەوە، ئیدی بەرەبەرەو بە شێوەیەکی بەرچاو ژمارەی لایەنگرانی کەم بۆوە، هێشتا ئێوارەی ئەو ڕۆژە دانەهاتبوو جگە لە سێسەد تا پێنج سەد کەسێکی زیاتر بە دەورەوە نەما،[٥] زۆرینەی ئەوانەی بە دەورەیەوە مابوونەوە لە

---

١ تأريخ الطبري (٢٩١/٦).

٢ مواقف المعارضة (ص: ٢٥٥).

٣ تأريخ الطبري (٢٩٢/٦).

٤ تأريخ الطبري (٢٩٣/٦).

٥ تأريخ الطبري (٢٩٣/٦).

تیرەی (موذحج) بوون، ئیبنوزیاد فەرمانی بە (عوبەیدوڵڵای کوڕی کەثیری کوڕی شـەهابی حارثی)ی کرد بە خۆیو ئەوانەی لـە ژێـر فەرمانیـدان لـە تـیرەی (مـوذحـج) بـچنە لایـانو ترسی جەنگو سزای سوڵتانیان بخەنە دڵەوەو لە موسلیمی کـوڕی عوقـەیلیان بتەکێننـەوە.[١] ئیتر ئیبنوزیاد فەرمانی بە محمدی کوڕی ئەشعەث کـرد بـە خـۆیو ئـەو خەڵکـەی لـە تـیرەی کیندەو حەزرەمۆت لە ژێر فەرمانیدان دەرچێتو ئـاڵای چـەپاڵەدان بـۆ هـەموو ئـەو کەسـانە بـەرز بکاتـەوە کـە لـە ڕیـزی هێزەکـەی موسـلیم دێنـە دەرەوەو سـەنگەری خۆیـان بـۆ لای ئیبنوزیاد دەگوازنەوە، هەمان فەرمانیـشی بەسـەر قـەعقاعی کـوڕی شـوری ذهلـیو شبثی کوڕی ڕیبعی تەمیمیو حیجاڕی کوڕی ئەبجەری عیجلیو شمەری کوڕی ذی جۆشەنی عـامری داداو، باقی سەرۆکهۆزە کوفەییەکانی تریشی لـە لای خـۆی گـل دانـەوە.[٢] ئـیتر لـە بەرانبـەر هەموو ئەو ڕێوشوێنە توندو بە پەلانـەی عوبەیـدوڵڵای کـوڕی زیـاد گرتنیەبـەرو، هـەموو ئـەو هەڕەشە توندو سامناکە سەختانەی یەخەی زۆرینەی ئـەو کەسـانەی دەگـرت کـە چـووبوونە پاڵ موسلیمی کوڕی عوقەیل، هێندەی نەخایاند ژمارەکە کەم بۆوەو تەنها شەست پیاوی بـە دەورەوە مانـەوە.[٣] ئـەمجا لـە لای (ڕەحبـە)وە جـەنگێك لـەنێوان موسـلیمو پـشتیوانانی لـە لایەكو محمدی کوڕی ئەشعەثو قەعقاعی کوڕی شوورو ئەبثـی کـوڕی ڕیبعـی ڕووی دا، وەکـو دەردەکەوێ کـە ئـەم جەنگـە زۆری نەخایانـد، کاتێـك قـەعقاعی کـوڕی شـور تەماشـای کـرد جەنگاوەرانی سەر بە (موسلیم) بە خاتری دەربـازبوون دەجـەنگن، لێـرەدا کـەلێنێکی دانـێ، ئیدی لەوێوە بـەرەو لای مزگـەوت دەرچـوون، کاتێـك کـە ئێـوارە داهـات، موسـلیم تـەنها بـە خۆیو شمشێرەکەیەوەو لە کۆڵانەکانی کوفەدا مایەوە.[٤]

٤ـ دەستگیرکردنو کوشتنی موسلیمی کوڕی عوقەیل:

(موسلیم) بە تەنها مـابۆوەو، بـەنێو کۆڵانـەکانی کوفـەدا هاتوچـۆی دەکـرد، لـە دەرگـای ماڵێکیدا، ژنێك دەرگای لێ کـردەوە، موسـلیم وتـی: تینومـە، ئـاوم بـدەرێ، ئـاوی بـۆ هێنـاو خواردیەوە، ئەمجا ژنەکە چووە ژوورەوە ئەوەندەی خودا حەز بکات لە ماڵ مایـەوە، ئـەمجا هاتە دەرەوە، تەماشای کرد هەر لەبەر دەرگا دانیشتووە، وتی: ها کاکە لێرە هەسـتەو بـڕۆ، دانیشتن لێرەدا جێی تۆمەتە، لە وەڵامیدا وتی: من موسلیمی کوڕی عوقەیلم، دەتوانی پـەنام

---

١ تأريخ الطبري (٦/٢٩١).
٢ تأريخ الطبري (٦/٢٩١).
٣ مواقف المعارضة (ص: ٢٥٧)، الطبقات (٥/٣٧٤).
٤ تأريخ الطبري (٦/٢٩٣).

بدەی؟ وتی: بەڵێ، ئیدی فەرمووی کردو بردیە ژوورەوە، کوڕی ئەو ژنە پیاوی محمدی کوڕی ئەشعەث بوو، بەمەی زانیو چوو محمدی ئاگادار کردەوە، ئەویش عوبەیدوڵلای خەبەردار کرد، عوبەیدوڵلاش بە مەبەستی دەستگیرکردنی پۆلە پۆلیسێکی بەسەر کرد، موسلیم لە ماڵ هاتە دەرو شمشێری لە کێلان دەرکێشاو دەستی بە شەڕ کرد، لەم نێوەدا (کە زانیان خۆ بە دەستەوە نادا) محمدی کوڕی ئەشعەث ئەمانی پێداو، ئەویش خۆی ڕادەست کرد.[1] لە ڕێگادا کە بۆ لای (ئیبنوزیاد)یان دەبرد کوڵی هەستاو گریا، پێی وترا: هەر کەسێك لە جێی تۆ بێو داوای ئەو شتە (گەورە) بکات کە تۆ داوای دەکەی ئەمجا ئەو نسکۆیەی بەسەردا بێ کە بەسەر تۆدا هاتووە، هێندە قایمە فرمێسکی بە چاودا نایەو ناگریا، موسلیم وتی: قەسەم بە خودا نە بۆ خۆم دەگریەمو نە شیوەن بۆ مەرگی خۆم دەکەم ئەگەرچی بە قەد چاوتروکانێك حەزم لێ نیە لەنێوچێ، بەڵکو پەرۆشی خزمو کەسوکارمە کە بەرەو ئێرە بەڕێ کەوتوون، بۆ حوسێنو خاووخێزانی حوسێن دەگریم، موسلیم ڕووی تەکلیفی لە محمدی کوڕی ئەشعەث کردو پێی وت: ئەی بەندەی خودا، بە خودا دەزانم کە لە بەرانبەر ئەندامانی مندا دەستەپاچەیو هیچت لە دەست نایە، ئایا ناتوانی ئەوەندە خێرە بکەی پیاوێك بۆ لای حوسێن بنێری تا لەسەر زمانی من پەیامێکی پێ ڕابگەیەنێ؟ من پێم وایە ئیمڕۆ یان سبەینێ بە خۆیو خانەوادەکەیەوە بۆ لای ئێوە بەڕێ دەکەوێ، خۆ دەبینی کە چەندەم پەلەیەو داخو خەفەت بۆ ئەم بارودۆخە دەخۆم، جا پێی دەڵێی: موسلیمی کوڕی عوقەیل منی بۆ لای تۆ ناردووە، ئێستا بە دەست ئەو تاقمەوە کراوە بە دیل، نازانێ بەیانی زوو دەیکوژن یان دەیگەیەننە ئێوارە، ئەو پێت دەڵێ: بە خۆتو خانەوادەت بگەڕێوە، با خەڵکی کوفە هەڵتنەخەڵەتێنن، ئەوانە بریتین لەو بەناو پشتیوانانەی باوکت کە ئاواتی دەخواست بە مەرگ یان بە کوشتن خێرا لێیان جیاببێتەوە، لە ڕاستیدا خەڵکی کوفە درۆیان لەگەڵ کردی، درۆیان لەگەڵ منیش کردو درۆزنیش خێری‌پێوە نیە، محمدی کوڕی ئەشعەث وتی: بە خودا ئەم کارەت بۆ دەکەمو، ئیبنوزیادیش تێ دەگەیەنم کە من ئەمانم پێ داوی، ئیدی محمد بانگی (ئیاسی کوڕی عەباسی طائی) کردو، پێی وت: بڕۆ خۆت بگەیەنە بە حوسێنو ئەم پەیامەی پێ ڕابگەیەنە، بۆ بەجێگەیاندنی ئەم کارە وڵاخێکی پێداو بڕیاریدا بژێوی ژیانو گوزەرانی ماڵو خێزانی بۆ دابین بکات.[2] (محمدی

١ سير أعلام النبلاء (٣٠٨/٣).

٢ البداية والنهاية (٤٨٨/١١)، تأريخ الطبري (٢٩٧/٦).

کوڕی ئەشعەث) (موسلیمی کوڕی عوقەیل)ی بردە لای (ئیبنوزیاد)، پێی ڕاگەیاند کە ئەو ئەمانی پێداوە، ئیبنوزیاد وتی: تۆمان بۆیە نەنارد تا ئەمانی پێ بدەی، ئیدی ئەمانەکەی لێ قبوڵ نەکرد.[1] (موسلیم) لەبەردەم دەروازەی کۆشك داوای کرد ئاوی خواردنەوەی پێ بدەن، عەمماری کوڕی عوقبە جامێك ئاوی ساردی بۆ هێنا، بەڵام لەبەر ئەوەی لەگەڵ خوێنی زامەکانی تێکەڵ دەبوو نەیتوانی بیخواتەوەو وازی لێ هێنا، چووە ژوورەکەی ئیبنوزیاد، ئیبنوزیاد پێی وت: من دەتکوژم، موسلیم وتی: هەر ئاوا؟ وتی: بەڵێ، وتی: لێم گەڕێ با وەسێتی خۆم بە یەکێك لە خزمەکانم بسپێرم، وتی: دەی وەسێت بکە، موسلیم تەماشای ئەندامانی مەجلیسی کردو (عومەری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص)ی بینی، وتی: ئەی عومەر، خزمایەتیەك لە نێوان منو تۆدا هەیە، کارێکم پێت هەیە، بەڵام نهێنیە وەرە لەگەڵم بۆ لایەکی کۆشك هەتا پێت بڵێم، هەتا ئیبنوزیاد ڕێیٔ پێ نەدا هەڵنەستا، هەستاو کەمێك لە ئیبنوزیاد دوور کەوتەوەو، موسلیم پێی وت: لە کوفەدا حەوتسەد درهەم قەرزدارم، بۆم بدەوە، تەرمەکەم لە ئیبنوزیاد وەرگرەوەو بە دەستی خۆت بیشارەوە، بۆ لای حوسێن بنێرە، من بۆم نوسیبوو کە هەموو خەڵکی لەگەڵدایە، پێم وایە بەڕێ کەوتبێ، عومەر هەستاو موسلیم چی پێ وت هەمووی بۆ ئیبنوزیاد گێڕایەوە، ئەویش ڕێگای پێداو هەموو ئەمانەی بۆ بەجێ بگەیەنێ‌و وتی: سەبارەت بە حوسێن بۆ لای ئێمە نەیا نایگێڕینەوە، ئەگەر مەبەستی ئێمەش بێ نایپارێزین، ئەمجا ئیبنوزیاد فەرمانی بە کوشتنی موسلیمی کوڕی عوقەیل کرد، برایە سەر بەرزایی کۆشك‌و سبحان الله والحمدلله ولا إله إلا الله والله أكبری دەکردو صەڵەواتی لێ دەدان‌و دەیوت: خودایە بە هەق حوکم لە نێوان ئێمەو قەومێکدا بکەی کە تەفرەیان داین‌و شکستیان دەرخوارددان، ئەمجا پیاوێك کە ناوی (بەکیری کوڕی حمران) بوو شمشێری لە گەردنداو کەللەسەرەکەی هەڵگرت‌و بەرەو خوارەوەی کۆشکی بەردایەوە، بە دوای سەریدا جەستەکەشی گلدایەوە.[2]

٥ـ کوشتنی هانیئی کوڕی عوروە:

عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد لە میانەی ئەو ڕێو شوێنەی گرتیەبەر لەبەرانبەر موسلیم‌و هاوەڵانی دڵڕەقی‌و بێ ویژدانی‌و زۆرداری خۆی سەلماند، فەرمانی دا هانی (هانیئ)بهێنرێتە بازاڕو بە بەرچاوی خەڵکەوە بکوژرێت، هەرچەندە هانی هاواری لە تیرەکەی خۆی

---

١ تأريخ الطبري (٦/٢٩٨).

٢ البداية والنهاية (١١/٤٩٠).

(موذەجەح) بەست بەڵام کەس بە دەمیەوە نەهاتو نەجاتی نەدا، ئەمجا تەرمی موسلیمو هانی بە جووتەو لە نێوەڕاستی بازاڕ بەرانبەر خەڵك بە داردا کران،[1] ئەمجا فەرمانی کرد سەری دوو کەسی تر لەوانەی نەخشەی سەرخستنی موسلیمی کوڕی عوقەیلیان داڕشتووە بپەڕێنرێنو ئەوانیش لە بازاڕ هەڵبواسرێن.[2] (ئیبنوزیاد) دەیتوانی موسلیمی کوڕی عوقەیلو هانیئی کوڕی عورووە بە قۆڵبەستکراوی بۆ لای خەلیفە لە دیمەشقی پایتەخت بنێرێت، لەوانەیە لەوێ لە باتی کوشتنو ڕشتنی خوێنو دروستکردنی ڕقو کینەو دوژمنایەتی لە نێوان موسڵمانانداﹶ، تەنها بەند کرابانایە یان عەفوکرابانایە. ئیبنوزیاد سەلماندی کە دەوڵەتەکەی دەوڵەتی ستەمو زۆرداریو داپڵۆسینەو لە پێناو پاراستنو هێشتنەوەی دەسەڵاتی خۆیدا هەموو شتێك بە خوێن ڕشتنیشەوە ئەنجام دەداو گوێ بە هیچ کامێك لە بەهاکان نادات.

هەروەك دیارە موسلیمی کوڕی عوقەیل (ڕەحمەتی خوای لەسەر بێ) ئەو پیاوە سیاسیە زۆرزانە نەبوو کە بەوپەڕی وریاییەوە بۆ ئایندە بڕوانێتو، کاروبارەکان بە تەرازووی ڕووداوەکانی مێژوو کێشانە بکاتو، ڕووداوەکانی ئێستا بە بەژنو باڵای ڕووداوەکانی پێشدا بگرێتو پێوانەیان بکات، لەبەر ئەمە دەبینین کە بە زۆریو بۆری ئەوانەی بەیعەتی پێ دەدەنو لەبەر دەستی فرمێسك دەڕێژنو دەگریەنو بەڵێن دەدەن کە پشتیوانی لە حوسێن دەکەنو سەری دەخەن، هەڵدەخەڵەتێتو پەلە دەکات نامە بۆ حوسێن دەنووسێتو داوای لێ دەکات بەرێ بکەوێو هانی دەدا. بە پەلە خۆی بگەیەنێتە کوفە چونکە بەیعەتی بۆ بەستراوە.[3] سۆزو خرۆشانی دەروونەکان بەشی ڕوخاندنی دەوڵەتو حوکومەتەکان ناکات، بەڵکو دەبێ سەرکردایەتیەکی سەرڕاستو بەرچاوڕوونو ڕێکخراوێکی تۆکمەو دامەزراو و نەخشەیەکی مەودا دوور بوونیان هەبێتو پەیوەندی لە نێوان تاکەکاندا توندو تۆڵ بێو ئامادەیی مادیو مەعنەوی لە تەك یەك حیسابیان بۆ کرابێ، دەتوانین بڵێین ئەوەی موسلیمی کوڕی عوقەیلو هانیئی کوڕی عورووە حیسابیان بۆ کردبوو، پشتیان پێ بەستبوو هەڵەو نادروست بوو، (موسلیم) گومانی برد کە ئەو سۆزو عاتیفەی دەبێتە داینەمۆو بزوێنەری ئاپۆڕای خەڵك بە گشتی تاکە ڕێبازی سەرکەوتنەو، ئیتر هیچ حیسابی بۆ ئەوە

---

١ البداية والنهاية (١١/٤٩٠)، تأريخ الطبري (٦/٣٠٢).
٢ تأريخ الطبري (٦/٣٠٢).
٣ الأمويون بين الشرق والغرب (١/٢٠٥).

نەکرد کە پێویستە پەیوەندی بە سەرۆکهۆزو تیرەکانی کوفەوە بکاتو پشتگیری ئەوانیش مسۆگەر بکات، هەروەها موسلیم هەوڵی نەدا ئەو هەموو خەڵکەی کە پەیوەندیان پێوە کردووە بە شێوەیەك ڕێك بخات کە دوایی ڕێکخراوێکی نهێنی بە گوێرەی چەند تایبەتمەندییەکی دیاریکراو سەرپەرشتی بکاتو بەبێ کۆتو بەند لە پەنهانیدا بێتو بچێ، بە هەمان جۆر ئەو لە بەرانبەر ڕێکخستنی هەموو ئەو ئیمکاناتەی لەبەر دەستی دانرابوو حەپەسابوو، خۆ ئەگەر ئەو سۆزو عاتیفەی بەسەر کۆمەڵگای کوفەدا زاڵ ببوو دوای ویستی خودا دەستەبەر بوو بۆ وەرسوڕاندنی کاروبارەکان بە باری بەرژەوەندی ئەودا بە مەرجێك ئەو هەستو سۆزە بە ڕێکوپێکیو ڕێی ڕاستی خۆیدا ڕێنما کرابایە، لە لایەکی ترەوە کە سەرنج لە لایەنەکەی تر دەدەین کە لە لایەنی پشتیوانو سەرخەرەو خۆی لە (هانیئی کوڕی عورِوە)دا نیشان دەدا، دەبینین (عورِوە) لەو کەسایەتیە هەرە دیارانە بوو کە پشتگیرییان لە موسلیم دەکرد، ئەو بۆ ئەمە بە هۆی هێزی زۆر و زۆری ژمارەی تیرەکەیەوە پشتی لێ کردبۆوەو پێی وابوو ئەو بە هۆی ئەوە یەکێکە لە سەرۆکەکانی (موراد) لە سزاو تۆڵە بە دوورە، مێژوونووسان دەڵێن: کاتێك هانئ سواری ئەسپەکەی دەبوو چوار هەزار سوارەی زرێپۆشو هەشت هەزار پیادەڕەوی لەگەڵ دەردەچوون، خۆ ئەگەر هاوپەیمانەکانیان لە تیرەی (کیندە)یان لەگەڵ کەوتبانایە، ئەوا ژمارەی هێزەکانی خۆیان لە سی هەزار سوارەی زرێپۆش دەدا.[١] بەڵام ئەو شتانەی هانی حیسابی بۆ کردبوون بەسەر چووبوون، هەموو ئەو پەیوەندیە گەرمو گوڕو توندو تۆڵە کۆنانە لەنێو خەڵکدا نەمابوون کە بە لایانەوە عەشیرەت چەقی کۆبوونەوەی بڕیاردانی هەموو لایەکەو سەرۆکی هۆز ئەو فەرماندە بە سامو هەیبەتەیە کە کەس لە قسەی دەرناچێت، بێگومان دابەشکردنی هۆزو تایەفەکان بەسەر هێزی چوارقۆڵیدا لە لایەن (زیاد بن أبیه) کاریگەری لەسەر ئەم لاوازبوونی پەیوەندیە دانابوو، بە هەمان شێوە سیستەمی دابەشکردنی موچەش بەرژەوەندی تیرەو هۆزەکانی بە دەسەڵاتی ئومەویەوە بەستبۆوە، لە ڕاستیدا ئەو حیساباتەی هانئ داکۆکی لەسەر دەکردنەوەو لەسەر ئەم بنەمایە پشتی بە تیرە بەستبوو هەر هەموویان وەکو تۆزی بانان بە هەوادا چوون.[٢]

---

١ مروج الذهب (٦/٣).

٢ مواقف المعارضة (ص: ٢٥٩ـ٢٦١).

لێرەدا یەکێك لەو شیعرانە دەخەینە ڕوو کە سەبارەت بە کوژرانی موسلیمی کوڕی عوقەیل‌و هانیئی کوڕی عوروە وتراون:

فإن كنت لا تدرين ماالموت فانظري — إلى هانئ في السوق وابن عقيل
أصابهما أمر الإمام فأصبحا — أحاديث من يسعى بكل سبيل
إلى بطل قد هَشَّمَ السيف وجهَهُ — وآخر يهدي من طمار قتيل
ترى جسداً قد غير الموت لونه — ونضح دم قد سال كل مسيل
فإن أنتم لم تثأروا بأخيكم — فكونوا بغيا أرضيت بقليل[1]

## شەشەم: گەیشتنی هەواڵی کوژرانی موسلیمی کوڕی عوقەیل بە حوسێن‌و گەیشتنی بە هێزە پێشوەخت نێردراوەکانی ئیبنو زیاد:

حوسێنی کوڕی عەلی (ڕەزای خوایان لێ بێت) لە ڕۆژی تەرویە ٨ی قوربانی ساڵی ٦٠ی کۆچی لە شاری مەککە دەرچوو، (عەمروی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص)ی والی مەککە دەرکی بە سامناکی ئەم هەڵوێستەی حوسێن کرد، بۆیە بە پەلە وەفدێکی خۆی بە بەشداری (یەحیای کوڕی سەعیدی کوڕی عاص)ی برای بۆ لا نارد، هەوڵیاندا لە بڕیارەکەی پەشیمان بکەنەوە، بەڵام داواکەیانی ڕەفزکرد، جا بانگیان کرد: ئەی حوسێن، ئەوە بۆ پارێز لە خودا ناکەی‌و لە ڕیزی کۆمەڵی موسڵمانان دەردەچیت‌و پەرتەوازەیی‌و دووبەرەکی لەنێو ئوممەتدا دروست دەکەی؟، حوسێن بە خوێندنەوەی ئەم ئایەتە پیرۆزە وەڵامی دانەوە: ﴿لِّي عَمَلِي وَلَكُمْ عَمَلُكُمْ أَنتُم بَرِيٓـُٔونَ مِمَّآ أَعْمَلُ وَأَنَا۠ بَرِيٓءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ﴾[2] واتە: کرداری خۆم بۆ خۆم‌و کرداری خۆتان بۆ خۆتان، ئێوە لەوەی دەیکەم بەرین‌و منیش لەوەی ئێوە دەیکەن بەریم. ئەمەو حوسێن بە خۆی‌و خانەوادەکەی‌و شەست کەس لە پێشسپیانی خەڵکی کوفە بەرەو عێراق بەڕێکەوت.[3] مەڕوانی کوڕی حەکەم نامەیەکی بۆ ئیبنو زیاد ناردو پێی وت: دوای ئەمە، ئەوا حوسێنی کوڕی عەلی بەرەو لات هات، ئەو حوسێنی کوڕی فاتیمەیە، فاتیمە کچی پێغەمبەری خودا (ﷺ)ە، قەسەم بە خودا کەسێك نیە خوا ژیانی پێ دابێ‌و سەلامەتی کردبێ لە حوسێنمان بە لاوە خۆشەویستتر بێ، ئاگات لە خۆت بێت‌و هەڵنەچی‌و کارێك بکەی

١ البداية والنهاية (١١/٤٩٠، ٤٩١).
٢ يونس (٤١).
٣ تأريخ الطبري (٦/٣٠٩)، مواقف المعارضة (ص: ٢٦٢).

هیچ شتێك قەرەبووی نەکاتەوەو لە بیر خەڵکی نەچێتەوەو باسو خواسی (هەتا قیامەت) بەردەوام بێ، والسلام علیك.[١] (عەمروی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص)یش نامەیەکی ئاراستە کردو، فەرمانی پێکرد کە بە وریایی ڕەفتار لەگەڵ حوسێن بکاتو نەکا بە خراپە ڕووبەڕووی ببێتەوەو پێی وت: دوای ئەمە لە ڕاستیدا حوسێن بەرەو لای تۆ بەڕێکەوت، ئا لەم جۆرە حاڵەتەدا یان خۆت ئازاد دەکەی یان چۆن خەڵك دەکرێنە کۆیلە ئاوا دەبیتەوە بە کۆیلە.[٢]

لە (ذات عرق)[٣]ی نێوان ڕێگەی حیجازو کوفە، حوسێن تووشی (الفرزدق)ی شاعیر بوو، لێرە حوسێن سەبارەت بە هەڵوێستی خەڵکی کوفە لە بەرانبەریدا پرسیاری لێکرد، کە ئەو تێڕوانینی چۆنە، ئەمجا بۆ ئەوەی (فرزدق) زیاتر ڕوونکردنەوە لەسەر بابەتەکە بدا، حوسێن وتی: ئەمە نامەو پەیمانەکانیانن کە لە لامن، (فرزدق) وەڵامی دایەوەو وتی: تووشی شکستت دەکەن، مەچۆ، تۆ بۆ لای گەلێك دەچی دڵیان بۆ تۆیەو دەستیان لە دژی تۆیە.[٤]

کاتێك یەزیدی کوڕی معاویە هەواڵی دەرچوونی حوسێنی لە مەککە بەرەو کوفە پێگەیشت، نامەیەکی بۆ ئیبنو زیاد ناردو هۆشداری دایەو پێی وت: هەواڵم پێ گەیشتووە، کە حوسێن بەرەو کوفە بەڕێ کەوتووە، سەردەمی تۆی لەنێو سەردەمەکاندا پێ تاقی دەکرێتەوە، وڵاتی تۆی لەنێو هەموو وڵاتاندا پێ ئەزموون دەدرێ، تۆشی لەنێو هەموو والیەکاندا پێ ئیمتیحان دەکرێ، لەم دەمەدا یان سەربەرزانە خۆت ئازاد دەکەی، یان پێیەوە گیرۆدە دەبیتو چۆن خەڵك دەکرێن بە کۆیلە ئاوا بەرەو کۆیلایەتی دەگەڕێیتەوە.[٥]

١ـ عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد ڕێو شوێنی ئەمنی دەگرێتەبەر:

ئیبنوزیاد لە پێناو بە یەکنەگەیشتنی خەڵکی کوفەو حوسێنو قایمکردنی دەسەڵاتی خۆی بەسەر کوفەدا چەند ڕێو شوێنێکی ئەمنی توندی گرتەبەر، سەربازگەلی کۆکردنەوەو بۆ ئەوەی دڵسۆزانە ئیشی بۆ بکەن پارەیەکی زۆری بەسەردا ڕشتن.[٦]

---

١ الطبقات (١٦٧/٥)، تهذيب الكمال (٤٢٢/٦)، مواقف المعارضة (ص: ٢٦٣).

٢ تهذيب الكمال (٤٢٢/٦)، مواقف المعارضة (ص: ٢٦٣).

٣ (ذات عرق) دوو قۆناغ لە مەککەوە دوورە.

٤ البداية والنهاية (٥١٠/١١).

٥ مجمع الزوائد (١٣٩/٩)، المعجم الكبير (١١٥/٣).

٦ الطبقات (٣٧٦/٥)، مواقف المعارضة (ص: ٢٦٤).

(حەصینی کوڕی تەمیمی طەهەوی)ی سەرۆکی دەزگای پۆلیسی بە خۆیو بە لەشکرێکەوە بەرەو (قادسیە) بەڕێ کرد، ئەو لەنێوان قادسیە بۆ خەفزانو[1] قادسیە بۆ قەتقەتانو[2] قادسیە بۆ لەعلەع[3] هەستا بەڕێکخستنی سوپای ئەسپسوار، ئەمجا فەرمانی بە (حەصین) کرد هەر کەسێك لەم نێوانانەدا تێپەڕیو نامۆو نەناسراو بوو دەستگیری بکات،[4] هەروەها فەرمانیدا هەر کەسێك لە ڕێگای نێوان (واقیصە-[5] شام)و (واقیصە-بەصرە) تێپەڕبێ بە پەلە قۆڵبەست بکرێو نەهێڵرێت کەس لەم نێوانەدا نەیەتە ژوورەوەو دەرنەچێ.[6] ئیبنوزیاد بەم بڕیارەی دوایەی ویستی پەیوەندی لە نێوان خەڵکی کوفەو حوسێندا بپچڕێ، ئەمەو حوسێنی کوڕی عەلی دوای دەرچوونی لە مەککە بەبێ ئەوە بزانێ چ گۆڕانکاریەك لە کوفەدا ڕووی داوە لەسەر ڕۆیشتنی بەردەوام بوو، کاتێك لەناوچەی (بطن الرمة) گەیشتە (حاجز)، (قەیسی کوڕی مەسهەری صەیداوی) بە نامەیەکەوە بەرەو کوفە بەڕێ کردو تێیدا هەواڵی بەڕێکەوتنی خۆی پێ ڕاگەیاندبوون،[7] بەڵام قەیس لەگەڵ گەیشتنی بە قادسیە لە لایەن (حەصینی کوڕی تەمیمی) یەوە دەستگیر کرا.[8] ئەمجا بۆ لای ئیبنوزیاد بەڕێ کرا.[9] هەروەها حوسێن نوێنەرێکی بۆ لای موسلیم بەڕێ کرد، ئەویش کەوتە بەردەستی (حەصین)و بۆ لای ئیبنوزیادی بەڕێ کرد، لەگەڵ گەیشت یەکسەر کوشتی،[10] ئەم بڕیارو ڕێوشوێنە توندوتیژانەی ئیبنوزیاد گرتبونیە بەر کاریگەری گەورەیان لەسەر دڵو دەروونی لایەنگرانی حوسێن دروست کردبوو، پێیان وابوو هەر کەسێك پەیوەندیەکی (کەمیشی) بە حوسێنەوە هەبێ کوشتنی سامناك سەرەنجامیەتی، بۆیە هەر کەسێك بیر لە سەرخستنی حوسێن بکاتەوە دەبێ ئەوە لەبەر چاوی خۆی دابنێ کە کۆتاییەکەی ئەم سەرەنجامە تاڵو

---

١ (خفضان): لەوانەیە (خەفان) بێ شوێنێکە لە نزیك کوفەیەو جاروبار حاجی پێیدا ڕەت دەبن.

٢ (قطقطان): شوێنێکە لە نزیك کوفەیە، لە باری وشکانیەوە لە قادسیە نزیکە.

٣ (لعلع): کەوتۆتە نێوان بەصرەو کوفەوە، ٢٠ میل لە کوفەوە دوورە.

٤ أنساب الأشراف (١٦٦/٣)، الطبقات (٣٧٦/٥).

٥ (واقصة): شوێنێکە کەوتۆتە سەر ڕێگای مەککە، ملکی (بەنی شهاب)ی سەر بە تیرەی (تەی)ە، ماوەی دوو قۆناغ لە (زوبالە) دوورە.

٦ أنساب الأشراف (٥٧٣/٣)، مواقف المعارضة (ص: ٢٦٥).

٧ البداية والنهاية (٥١٢/١١).

٨ تأريخ الطبري، نقلا عن مواقف المعارضة (ص: ٢٦٦).

٩ الطبقات (٣٧٦/٥)، أنساب الأشراف (١٦٧/٣).

١٠ أنساب الأشراف (١٦٧/٣)، مواقف المعارضة (ص: ٢٦٦).

تفتە بە ئێشەیە.[١] حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) هەستی کرد کە کاروبارەکان لە کوفەدا بە شێوەیەکی نائاسایی بەڕێوەدەچن، بە تایبەتی دوای ئەوە کە عەرەبە دەشتەکیەکان پێیان ڕاگەیاند کە بە هیچ کلۆجێك کەس بۆی نیە بچێتە نێو کوفەوەو لە کوفە بچێتە دەرەوە،[٢] بە تەك هەر کامێك لە تیرە عەرەبەکانی سەر ڕێدا ڕادەبووری، هۆشدارییان پێ دەداو، لەو هەڕەشەو مەترسیانەیان ئاگادار دەکردەوە کە بەرەو ڕوویان هەنگاو دەنێ، بەڵام حوسێن هەموو جار ئەو ژمارە زۆرەی بەبیر خۆ دێنانەوەو ئامازەی پێ دەدان کە بەیعەتی سەرخستنیان پێ داوەو دەیکردنە بەڵگەی سەرکەوتنی خۆی،[٣] کاتێك گەیشتنە زبالە[٤] بەپێی ڕیوایەتێکی تر (شراف).[٥] هەواڵی کوژرانی موسلیمی کوڕی عوقەیل‌و هانیئی کوڕی عوروەو عبداللەی کوڕی بقطرو بەزینی خەڵکی کوفەی لە بەرانبەر سەرخستنیدا پێگەیشت.[٦] ئەم هەواڵە دلتەزێنە کاریگەری توندی لەسەر حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) دانا، تا ئەمانە نزیکترین کەس بوون لێیەوەو کوژران، شیعەکانی کوفەش لە بەرانبەر سەرخستنیدا بەزین‌و دۆڕانیان بەسەردا هات.[٧]

٢ـ حوسێن ڕێ بە هاوەڵانی دەدا بەجێی بێڵن:

کاتێك حوسێن هەواڵی کوژرانی موسلیمی کوڕی عوقەیلی ئامۆزای‌و بەزین‌و داوەشانی خەڵکی کوفەی لە ڕاست سەرخستنیدا پێگەیشت، خەڵکانی گەلی لەمە ئاگادار کردەوەو وتی: کێ حەز دەکا بڕوا با بڕوا، ئیدی خەڵك بە ڕاست‌و چەپدا بڵاوەیان لێکرد.[٨] یەکێك لەوانەی کە لەگەڵیدا مابوونەوە پێی وت: خودات بە گژدا دەکەین بگەڕێوە، لە کوفە نە لایەنگر نە سەرخەرت نیە، بەڵکو دەترسین ئەوانیش لە دژی تۆ بن، کوڕانی عوقەیل‌و براکانی موسلیم پێی خۆیان چەقاندن‌و، وتیان: وەڵڵاهی ئەلێرە ناڕۆین هەتا تۆڵەی خۆمان نەکەینەوە، یان موسلیم چۆن کوژرا ئێمەش ئاوا دەکوژرێین.[٩]

---

١ مواقف المعارضة (ص: ٢٦٦).

٢ أنساب الأشراف (٣/١٦٨)، مواقف المعارضة (ص: ٢٦٦).

٣ الطبقات (٥/٣٧١).

٤ (زبالە): شوێنێکی بەناوبانگەو کەوتۆتە سەر ڕێگای مەککە–کوفە.

٥ (شراف): کەوتۆتە نێوان واقیصەو قەرعاو، هەشت میل لە (ئیحساء)ەوە دوورە.

٦ تأريخ الطبري (٦/٣٢٢).

٧ مواقف المعارضة (ص: ٢٦٧).

٨ تأريخ الطبري (٦/٣٢٣).

٩ تأريخ الطبري (٦/٣٢٢).

٣ـــ بەیەککەیشتن لەگەڵ (حوڕی کوڕی یەزیدی تەمیمی)ی سەرکردەی مەفرەزە پێشوەختنێردراوەکانی کوفە:

خەڵك حوسێنیان بەجێ هێشت، جگە لەو کەسانەی لە مەککەوە لەگەڵی هاتبوون کەسی تری بە دەورەوە نەما، لەسەر ڕۆیشتن بەردەوام بوو، هەتا گەیشتە (شراف)، لێرەدا فەرمانی بە کوڕەکانی کرد ئاو هەڵێنجنو خەزنی بکەن، ئەمجا ڕۆیشت تا نیوەڕۆ داهات، لێرەدا یەکێك لە هاوەڵانی (ألله أكبر)ی کرد، حوسێن وتی: الله أكبر، بۆچی تەکبیرت لێدا؟ کابرا وتی: باغە دارخورمایەك دەبینم، دوو پیاو وتیان: لەم ناوچەیەدا قەت دارخورمامان نەدیوە، حوسێن وتی: ئەی پێتان وایە چی بینیوە؟ وتیان: پێمان وایە چاوی بە ڕەوە ئەسپ کەوتبێ، کابرا وتی: دە بە خوا من شتێکی لەو بابەتە دەبینم.[١].... کتومت وابوو، پێشەنگی ئەسپسوارانی سوپای ئیبنوزیاد بوون،و ژمارەیان هەزار ئەسپسوار بوو، حوڕی کوڕی یەزید فەرماندەیان بوو، کە لە (شراف )نزیك بۆوە چاوی بە حوسێنو هاوەڵانی کەوت، حوسێن داوای لێکرد ڕێگای پێ بدا بگەڕێتەوە، لە وەڵامدا وتی: کە ئەو ناتوانێ ڕێی بدا، بەڵکو ئەو فەرمانی پێ کراوە لەگەڵ خۆیدا بۆ کوفەی بەرێ، حوسێن هەستاو دوو توربێنی پڕ لە نامە هەڵڕشتو وتی ئەمە هەموو نامەی ئێوە (واتە خەڵکی کوفە)ن، داواتان کردووە بێم بۆ لاتان، حوڕو هاوەڵانی سەریان باداو لاموجیمیان کردو وتیان: کە ئەوان کەمو زۆر پەیوەندیان بەو نامانەوە نیە.[٢] لێرەدا حوسێن چوونە کوفەی لەگەڵ (حوڕ) ڕەت کردەوەو، پێداگیری کرد کە کاری لەم جۆرە ناکات، (حوڕ) پێشنیاری بۆ کرد ڕێگایەك بگرێتەبەر لە کوفەی دوور بخاتەوەو بەرەو مەدینەی نەگێڕێتەوە، ئەمە لە پێناوی ئەوەدا (لو ماوەیەدا)حوڕ بە فەرمانی ئەو نامە بۆ ئیبنوزیاد بنوسێو، حوسێنیش بە فەرمانی ئەو نامە بۆ یەزید بنووسێ،[٣] ئیتر حوسێن لای قۆڵی چەپی گرتو لە ڕێی عەذیبو قادسیەوەو سەرەوژوور ڕێی شامی گرتەبەر.[٤] (حوڕ)یش لەم قۆڵەوە بە ڕێکی لەگەڵ حوسێن ڕۆیشتو، لە ڕێگادا ئامۆژگاری حوسێنی دەکردو خودای بە گژدا دەکرد کە جەنگ نەکاتو، بۆی ڕوون کردەوە ئەگەر شەڕ

---

١ تأريخ الطبري (٦/٣٢٥).

٢ تأريخ الطبري (٦/٣٢٧).

٣ تأريخ الطبري (٦/٣٢٨).

٤ تأريخ الطبري (٦/٣٢٨).

بکات دەکوژرێت،[١] هەر کات وەختی نوێژ دادەهات حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) ئیمامەتی بۆ هەردوو لایەنەکە دەکرد.[٢]

٤ـ بەیەکگەیشتنی لەگەڵ عمری کوڕی سەعدی کوڕی وەقاص‌و ئەنجامدانی وتووێژ:

هەرکە حوسێن گەیشتە کەربەلا، سوپای دەوڵەتی ئومەویش بە سەرکردایەتی عمری کوڕی سەعدو بە بەشداری چەند سوپاسالارێکی وەك شمری کوڕی جوشن‌و حەصینی کوڕی تمیم گەیشتە ئەوێ.[٣] ئەم سوپایە کە لە چوار هەزار جەنگاوەر پێك هاتبوو عمر سەرکردایەتی دەکرد، لە بنەڕەتدا بۆ غەزای (دەیلەم) لە (ڕەی) سازکرابوو، ئیبنوزیاد فەرمانی کرد ڕووی خۆی بەرەو کوشتاری حوسێن‌و هاوەڵانی وەرسوڕێنێ، سەرەتا عومەری کوڕی سەعدی فەرماندە فەرمانەکەی ڕەفز کرد، بەڵام ئیبنوزیاد هەڕەشەی لێکردو وتی: ئەگەر ئەمە نەکات ئەوا لێی دەخات‌و خانووەکەی لێ دەتەپێنێت‌و دەیکوژێت، ئیتر عمر لە ژێر گوشاری ئەم هەڕەشانەدا ملیدا.[٤]

ناوی (الطف)[٥] بەسەر ناوچەی کەربەلادا بڕابوو، کە حوسێن گەیشتە ئەوێ سوپای ناوبراو گەمارۆی دا، حوسێن لەگەڵ عومەری کوڕی سەعد دەستی بە گفتوگۆ کردو، بۆی ڕوون کردەوە کە ئەو لەسەر داوای کوفییەکان هاتووەو بەڵگەی بۆ ڕاست‌و دروستی قسەکەی هێنایەوەو ئاماژەی بۆ ئەو دوو جانتا گەورەیە کرد کە پڕ بوون لە نامەکانیان‌و ناوی هەموو ئەوانەی تێدایە کە بەیعەتیان پێی داوە، عومەری کوڕی سەعد چی لە حوسێن بیست لە دوتوێی نامەیەکدا نوسی‌و بۆ ئیبنوزیادی بەڕێکردو وتی: بسم الله الرحمن الرحیم، دوای ئا ئەمە، من کە گەیشتمە ئەو ناوچەیەی حوسێن لێی هەڵدابوو، نوێنەری خۆم بۆ لا نارد، پرسیارم لێکرد چ شتێك بۆ ئێرەی هێناوەو چی داوا دەکات، لە وەڵامدا وتی: خەڵکی ئەم وڵاتە نامەیان بۆ نووسیوم‌و نوێنەرەکانیان بۆ لام هاتون، داوایان لێ کردم بێمە لایان، بەڵام کە ئێستا پێیان خۆش نیەو، بۆچونێکی تریان بە پێچەوانەی داوای نوێنەرەکانیان بۆ

---

١ تأریخ الطبري (٦/٣٢٩).

٢ تأریخ الطبري (٦/٣٢٦).

٣ أنساب الأشراف (٣/١٦٦).

٤ تأریخ الطبري (٦/٣٣٥).

٥ (الطَف): ئەو خاکە بەرزەیە بەسەر وڵاتی عەرەبدا دەڕوانێ، بریتیە لە ناوچەیەکی فراوانی گوندنشینی سەر بە کوفە.

دروست بووەو لە لا شیرین بووە، ئەوا من لێیان لا دەدەم، جا کە ئەم نامەیە بۆ ئیبنوزیاد خوێنرایەوە ئەم کۆپلە شیعرەی شاعیری خوێندەوە:

ألآن إذا علقت مخالبنا به    يرجوا النجاة ولاة حين مناص

واتە: ئا ئێستا کە چنگو نینۆکی ئێمەی لێ گیر بووە، بە ئومێدە ڕزگار ببێ؟! ماوەی دەربازبوون بەسەر چووە.

ئەمجا ئیبنوزیاد بەم جۆرە وەڵامی نامەکەی عومەری کوڕی سەعدی دایەوە: بسم الله الرحمن الرحيم، پاش ئەمە، نامەکەتم پێگەیشت، چت باس کردبوو تێی گەیشتم، پێشنیاری بەیعەت دان بە یەزیدی کوڕی معاویە بۆ حوسێنو تێکڕای هاوەڵانی بخەڕوو، جا ئەگەر ئەمەی کرد ئەوا دوای ئەمە بڕیاردان بەدەستی خۆمانە، والسلام. کە عومەری کوڕی سەعد نامەکەی ئیبنوزیادی تەماشا کرد، ئەو لوتبەرزی و کەللەڕوتیەی لەخۆ گرتبوو دڵگران بوو، زانی کە ئەو ئاشتی ناوێ.[1] حوسێن پێشنیارەکەی ڕەفز کرد، ئەمجا کە سەختیو مەترسی هەڵوێستەکەی تەماشا کرد داوای لە عومەر کرد ڕاستەوخۆو ڕووبەڕوو گفتوگۆی لەگەڵ بکات.[2] حوسێن بە نۆبەی خۆی لەم مشتومڕەدا پێشنیارێکی خستەڕوو، کە خۆی لە سێ خاڵدا دەنواندو داوای لێ کردن کە دەرفەتی بدەن یەکێك لەم سێ خاڵانە جێبەجێ بکات:[3]

أ- لێی گەڕێن بۆ ئەو شوێنە بگەڕێتەوە کە لێیەوە هاتووە.

ب- یان لێی گەڕێن بڕواتە شامو دەست بخاتە نێو دەستی یەزیدی کوڕی معاویەوە.

ج- یان بە هاوشانی ئەوان بە خۆیو هاوەڵانیەوە بەرەو هەر کامێك لە سەنگەرەکانی پێشەوەی سنووری ئیسلام بێتو ئەویش یەکێك بێت وەك ئەوانو، ئەوان چ ئەرکێکیان لەسەر بێ ئەویش لەسەری بێو، چ مافێکیشیان هەبێت ئەویش هەیبێت.[4] بەڵێ حوسێن چەندجار ڕەزامەندی خۆی لەسەر ڕۆیشتن بەرەو لای یەزید دەربڕی.[5] عومەری کوڕی سەعد نامەی بۆ ئیبنوزیاد نووسی کە ئەم کێشە ئاڵۆزە چارەسەر بووەو، ئاشتی مسۆگەر بووەو، ئیبنوزیاد تەنها ئەوەی لەسەرە ڕازی بێ.[6]

---

١ تأريخ الطبري (٦/٣٣٧).

٢ المحن لأبي العرب (ص: ١٥٤).

٣ المصدر نفسه (ص: ١٥٤).

٤ المصدر نفسه (ص: ١٥٤).

٥ أنساب الأشراف (٣/١٧٢، ٢٢٤)، بإسناد صحيح، وتوبع عند الطبري باسناد صحيح.

٦ تأريخ الطبري (٦/٣٤٠).

له ڕاستیدا خەریك بوو ئیبنوزیاد قایل بێ، بەڵام شمری کوڕی ذی جوشن کە لە کاتی هاتنی نامەکەدا لە مەجلیسی ئیبنوزیاد دانیشتبوو له بەرانبەر ئەوە کە بۆ لای یەزیدی بنێرێ بەرهەڵستی کرد، وتی ڕای پەسند ئەوەیە داوا له حوسێن بکات لەسەر حوکمی خۆی (واتە ئیبنوزیاد) دابەزێو، بەمەش ئەو دەبێتە خاوەن بڕیاری یەکلاکەرەوە لەسەری.[1] کاتێك حوسێن هەواڵی ڕەتکردنەوەی داواکەی پێ گەیشت، وتی: نا، بە خوا هەرگیز لەسەر حوکمی عوبەیدوڵلای کوڕی زیاد دانابەزم.[2] ڕووی لەو هاوەڵانەی کرد کە تا ئەو کاتە لەگەڵیدا مابوونەوەو پێی وتن: ئێوە ئازاد بنو بۆ خۆتان خاوەنی بڕیاری خۆتان بن، بەڵام ئەوان سوور بوون لەسەر ئەوە کە تا گەیشتن بە شەهیدی پشتی بەرنادەنو جەنگ دەکەن.[3] کاتێك ئیبنوزیاد بۆ (نوخەیلە)[4] چوو، وەکو ئیحتیات چەند ڕێوشوێنێکی ئەمنی توندی گرتەبەر، عەمروی کوڕی حدیثی بەسەر کوفەوە بەجێ هێشت، دەستی بەسەر پردەکەدا گرتو ڕێی نەدا کەس بەسەریدا بپەڕێتەوە، بە تایبەت دوای ئەوە کە زانی هەندێك خەڵك لە کوفە بە نیازن بەرەو لای حوسێن دەربچن.[5]

## حەوتەم: جەنگی یەکلاکەرەوە، شەهیدبوونی حوسێنو هاوەڵانی:

حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) لە بەرەبەیانی هەینی ساڵی ٦١ك هاوەڵانی خۆی ڕێکخستنو بڕیاری بەرەنگاربوونەوەی سوپاکەی ئیبنوزیادی دا، ٣٢ سوارو ٤٠ شمشێر بەدەستی پیادەی لەگەڵدا بوون، زوهەیری کوڕی قینی بەسەر قۆڵی ڕاستەوە دانا، حەبیبی کوڕی موظاهیری بەسەر قۆڵی چەپەوە دانا، ئاڵاکەی دایە دەست عەباسی کوڕی عەلی، ماڵو خێزانەکانیشیان لە پشت خۆیانەوە دانان، لە ترسی ئەوە نەبادا لە پشتەوە هێرش بکرێتە سەر ماڵو منداڵو خێزانەکانیان، حوسێن بۆ ئەم قۆڵە فەرمانی کرد سووتەمەنی لە دارو قامیشو چیلکەو پوشو پەلاش کۆبکرێتەوەو ئاگری تی بەر بدرێت،[6] عومەری کوڕی سەعدیش سوپاکەی بەم شێوەیە ڕێك خست، عەمروی کوڕی حەجاجی زوبێدی لەجێی حوڕی کوڕی یەزید (کە پەیوەندی بە حوسێنەوە کرد) بەسەر قۆڵی ڕاستەوە دانا، شمەری کوڕی

---

١ تأريخ الطبري (٦/٣٤٠، ٣٤١).
٢ حقبة من التأريخ (ص: ١٣٢)، تأريخ الطبري (٦/٣٤٢).
٣ تأريخ الطبري (٦/٣٤٦).
٤ (النخيلة): نوخەیلە واتە دارخورما بچکۆلەکە، شوێنێکە کەوتۆتە نزیك کوفەوە.
٥ الطبقات (٥/٣٧٨).
٦ تأريخ الطبري (٦/٣٤٩).

ذی جوشنی بەسەر قۆڵی چەپەوە دانا، عوزرەی کوڕی قەیسی ئەحمەسی کردە فەرماندەی هێزی سوارە، ڕیبعی کوڕی ڕیاحی کردە فەرماندەی هێزی پیادە، ئاڵاکەی دایە دەست ذووەیدی خزمەتکاری.[1] جەنگ بە خێرایی دەستی پێکردو، تا بڵێی دەستەویەخە بوو، سوپاکەی عومەر لە لایەن هاوەڵانی حوسێنەوە تووشی بەرەنگاربوونەوەیەکی توند بوو، ئەوان بە حوکمی ئەوە هیچ هیوایان بە ژیان نەمابوو بەوپەڕی پێشمەرگانەو گیانبەختانە هاتبوونە گۆڕەپانی جەنگەوە،[2] حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) لەسەرەتادا بەشداری جەنگی نەکرد، بەڵکو هاوەڵانی دەورەیان لێ دابوو بەرگریان لێ دەکرد، کاتێك هاوەڵانی دەورەی کوژرانو بە تەنیا مایەوە، کەس زاتی نەدەکرد بیکوژێت، سەربازانی سوپاکەی عومەر نەیادا بە کوشتنی حوسێن گرفتارو ماڵ وێران–ی دنیاو قیامەت– بن نەرمە بەرگریەکیان دەکردو خۆیان دەخافڵاندو بە ئاواتی ئەوە بوون خۆ بەدەستەوە بدات، بەڵام حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) وێڕای دەست کردنەوەو بەگژداچوونەوە ئازایەتیەکی بێ وێنەو ناوازەی نیشان دەدا، لەو دەمەدا شمەری کوڕی ذی جوشەن ترسا ڕێشمەی کاروبارەکان لە دەست دەرچێ، بۆیە بەسەر سەربازگەلیدا قیژاندو فەرمانی کرد بیکوژن، جا پەلاماریان داو، زەرعەی کوڕی شەریکی تەمیمی شمشێرێکی لێ دا، پاش ئەو سنانی کوڕی ئەنەسی نەخەعی شمشێرێکی تری لێداو سەری لە لاشە جودا کردەوە.[3] دەشوترێت کە ئەو دوو کەسەی هەستان بە کوشتنی حوسێن، عەمروی کوڕی بطاری تەغلەبی‌و زەیدی کوڕی ڕەقادەی حینی بوون.[4] هەروەها دەوترێت: کە شمەری کوڕی ذی جۆشنی زەبی هەڵمەتی پەلاماردانی سەری ساز کردو، خەولی کوڕی یەزیدی ئوصبوحی سەرەکەی بۆ لای ئیبنوزیاد برد.[5] ئەمەو کوژرانی حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) لە ڕۆژی ١٠ محرم/ ٦١ی کۆچیدا ئەنجام دراو،[6] لەم جەنگەدا ٧٢ هاوەڵی حوسێن‌و، ٨٨ سەربازی سوپای عومەر کوژران.[7] دوای کۆتایی هاتنی جەنگ، عومەری کوڕی سەعد فەرمانی کرد، کە نابێ کەس بە لای هاوسەرو منداڵانی حوسێندا

---

١ تأريخ الطبري (٦/٣٤٩).
٢ تأريخ الطبري (٦/٣٥٠).
٣ تأريخ الطبري، نقلا عن مواقف المعارضة (ص: ٢٧٦).
٤ تأريخ الطبري، نقلا عن مواقف المعارضة (ص: ٢٧٦).
٥ تأريخ الطبري (٦/٣٨٥).
٦ تأريخ الطبري (٦/٣٢٥).
٧ الطبقات (٥/٣٨٦)، إسناد جمعي، تأريخ الطبري (٦/٣٨٥).

بچێتو بە خراپە ڕووبەڕوویان بێتەوە،[١] ئەمجا عومەر کەللەسەری حوسێنو تەواوی ئەندامانی خێزانو بنەماڵەی حوسێنی بۆ لای ئیبنوزیاد بەڕێ کردن.[٢]

ئەو کەسانەی لە بنەماڵەی (ئەبو تالیب) لەگەڵ حوسێن بوونو کوژران، یەکەم: لە کوڕانی عەلی کوڕی ئەبو تالیب: (حوسێن، جەعفەر، عەبباس، أبوبکر، محمد، عثمان)، لە کوڕانی حوسێن: (عەلی ئەصغەرو عەلی ئەکبەرو عبدالله) کە لەگەڵ باوکیان کوژران، تەنها علی زین العابدین ڕزگاری بوو.

لە کوڕانی حسن: (عبدالله، قاسم، أبوبکر).

لە کوڕانی عوقەیل: (جەعفەر، عبدالله، عبدالرحمن)، موسلیمی کوڕی عوقەیلیش لەگەڵ عبداللەی کوڕی لە کوفە کوژران.

لە کوڕانی عبداللەی کوڕی جەعفەر: (عەون، محمد).[٣]

ئەمەو لەم جەنگە لاسەنگو نابەرانبەرەدا (١٨) پیاو کوژران، کە هەر هەموویان سەربە خانەوادەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) بوون، لێرەدا ئەوەی جێی تێڕامانو سەرسوڕمان بێ ئەوەیە، کە ژمارەیەك لەوانەی لەبەر چاوی حوسێن کوژران بریتی بوون لە: (أبوبکری کوڕی عەلی، عثمانی کوڕی عەلی، أبوبکری کوڕی حسن)، کاتێك گوێ لە کاسێتەکانی شیعە دەگری، یان ئەو کتێبانەیان دەخوێنینەوە کە سەبارەت بە کوژرانی حوسێن نووسراون، ئەم ناوانە نابیستیو ناخوێنیەوە، ئەمە بە خاتری ئەوەیە تا نەوترێ: عەلی کوڕی ئەبو تالیب کوڕانی خۆی بەناو (أبوبکرو عمرو عثمان)ەوە کردوون، حەسەنیش یەکێك لە کوڕەکانی خۆی بەناو أبوبکر کردۆتەوە، بە ڕاستی ئەم کارەیان جێی تێڕامانو سەرسوڕمانە.[٤]

لە (أنس)ەوە ڕیوایەت کراوە: کاتێك سەری حوسێنیان لەبەردەم ئیبنوزیاد دانا، بە نووکی سەرەنێزەکەی (یان شمشێرەکەی) لێوەکانی هەڵدەدانەوەو ددانەکانی پێشەوەی دەردەخستو دەیوت: پێم وابێ شۆخو شەنگ بوو، جا وتم: وەڵلاهـ داخت بە دڵەوە دەنێم، من پێغەمبەری خودا (ﷺ)م بینیوە کە دەمی دەخستە سەر ئەو شوێنەو ماچی دەکرد کە تۆ نوکی سەرەنێزەکەی پێدا دێنێ جا سەرەنێزەکەی کێشایەوە.[٥] بە گوێرەی گێڕانەوەکی

---

١ الطبقات (٥/٣٨٥)، مواقف المعارضة (ص: ٢٧٧).

٢ تأريخ الطبري، نقلا عن مواقف المعارضة (ص: ٢٧٦).

٣ تأريخ خليفة بن خياط (ص: ٢٣٤).

٤ حقبة من التأريخ (ص: ١٣٥، ١٣٦).

٥ مسند أبي يعلى، رقم (٣٩٨١).

بوخاری لە ئەنەسەوە وتی: سەری حوسێن بۆ لای عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد هێنرا، خرایە نێو تەشتێکەوە سەری بەسەردا شۆڕکردبۆوەو، سەبارەت بە جوانی‌و ناسکی ئەو قسەیەکی کرد، أنس وتی: لە ڕاستیدا ئەو (واتە حوسێن) لە هەمووان زیاتر شێوەی بە پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەچوو،قژی سەرو ڕیشی بە وسمە ڕەنگکرابوو.[١] کاتێك هاوسەرو منداڵەکانی حوسێن گەیشتن، ئیبنوزیاد فەرمانی کرد لە خانوویەکی قەراغی شار میوانداریيان لێ بکرێت‌و، پۆشاك‌و خواردنی تەواویان پێ بدرێت.[٢] بە گوێرەی چەند ڕیوایەتێك (کە بۆنی هی شیعەیان لێ دێت) ئیبنوزیاد فەرمانی کرد هەر مێردمنداڵێك خەتوخاڵی باڵقی لە سەروبەر لێ دەرکەوتبێ دەبێ بکوژرێت، بەلام ڕووی درۆی ئەم ڕیوایەتانە خۆی دەردەخات، کاتێك دەڵێن: عەلی کوڕی حوسێن پشکنینی بۆ کرا، بینیان کە مووی لێ ڕوواون، جا ئیبنوزیاد فەرمانی کرد بیکوژن، بەلام زێنەبی خوشکی (کە زۆری خۆش دەویست) تکای بۆ کردو نەیانکوشت.[٣] هەروەها فڕی بەسەر ڕاستیەوە نیە کە گوایە ئیبنوزیاد دوای کوژرانی حوسێن یان لە میانەی بەڕێ کردنیاندا بۆ شام بە خراپی هەڵسوکەوتی لەگەڵ هاوسەرەکانی حوسێن کردبێ، گێڕانەوە مێژووییەکان پێمان دەڵێن کە جوانترین‌و باشترین کارێك ئیبنوزیاد ئەنجامی دابێ بریتیە لەوە کە فەرمانی کرد هاوسەرو منداڵانی حوسێن لە خانوویەکی قەراغی شار دابنرێن‌و ڕسق‌و ڕۆزی تەواوو پۆشاکی پێویستیان پێ بدرێ.[٤] إبن تيمية بەرپەرچی هەندێك لەو شیعە درۆزنانە دەداتەوەو دەڵێ: بەلام ئەوەی باسی دەکەن کە گوایە ژنەکانی حوسێن کراون بە دیل‌و لەسەر پشتی وشتری زین نەکراو شارەو شاریان پێکراوە، درۆو دەلەسەیەکی پوچ‌و بێ بنەمایە، سوپاس بۆ خودا قەت موسڵمانان یەك هاشمییان نەکردۆتە کۆیلە، هەرگیز ئوممەتی محمد (ﷺ) بۆ خۆیان حەڵاڵ نەکردووە تاقە کیژێکی هاشمی بگرن‌و بیکەن بە کەنیزەك، بەلام خەڵکانی نەفام درۆی زۆرگەورە دەکەن.[٥] بەڵکو قسەی پەسند ئەمەیە: دوای دەرچوونی هەوای سەرکەوتن لە کەللەیدا، ئیبنوزیاد هەستی بە زەبەلاحی هەڵەو تاوانی خۆی دەکردو، ئەم هەستە بەسەر هەندێك لە ئەندامە نزیکەکانی خێزانەکەیدا زاڵ ببوو، دایکی پێی دەگوت: واوەیلاو دادو فوغان بۆ تۆ، ئەوە چیت کرد، چ

١ البخاري، رقم (٣٧٤٨).
٢ أنساب الأشراف (٣/٢٢٦)، إسناده صحيح.
٣ أبو العرب (ص: ١٥٧).
٤ الدولة الأموية المفترى عليها (ص: ٣٢٢).
٥ منهاج السنة (٢/٢٤٩).

گوناهێکی گەورەت ئەنجام دا![1] عوسمانی کوڕی زیادی برای دەیوت: قەسەم بە خودا حەزم دەکرد هەر هەموو کوڕو نەوەکانی زیاد (فیل ئاسا) سەرو پەتیان لە لوت کرابایەو هەتا قیامەت بێگارییان پێ کرابایە، بەڵام حوسێن نەکوژرابایە، ئیتر عوبەیدوڵڵاش بەرپەرچی نەدەدایەوەو هیچ خۆی لێ قەڵس نەدەکرد.[2]

## هەشتەم: چەند هەڵوێستێکی جوامێرانە لە بەرانبەر حوسێندا:

لێرەدا چەند هەڵوێستێکی جوان دەبینین کە هەست دەبزوێننو تاسەوموچوڕك بە بەدەندا دێنن، مێژوو ئەم هەڵوێستانەی بە ناوی خاوەنەکانیانەوە تۆمار کردووە، هەتا بۆ خەڵك دەرکەوێ، کە لە هەموو چاخێکدا کەسایەتگەلێك هەن لە پێناو گرتنی ڕێزی خەڵکانی تر، پیاوەتی خۆیان نیشان دەدەنو بە خاتری بەرژەوەندی ئەوان هەڵوێست دەنوێنن، ئەگەرچی ئەوانەی لە بەرانبەر ئەو جۆرە جوامێرانەدا دەوەستنەوە باڵادەستیش بن، ئەو کەسایەتیانە لە کاتی پێویستدا جێگەو پێگەی کۆمەڵایەتی بەسەر جێگەو پێگەی سیاسیو سەربازیدا هەڵدەبژێرنو لایەنگری ئەو جۆرە پیاوانە دەکەن کە بە زانیاریو ئازایەتیو تەقواو لە خوداترسان ناوبانگیان دەرکردووەو، سەنگەری دژەبەرەکانیان چۆڵ دەکەن، ئەگەرچی ئەودژەبەرانە حوکمڕانو دەستڕۆیشتووش بن، ئیتر ترسان لە حوکمڕان قەدرو بەهای پیاوانەیان لەبیر ناباتەوەو، ستەمی حوکمڕان بەرەو دووڕوویىو چاپلوسیان نابا، ئەو پۆستو پایە بەرزانەی پێیان دراوە لە ئازایەتیو پیاوەتیو ڕادەبڕینی ڕاشکاوانەیان دوور ناخاتەوە،[3] لەو جۆرە هەڵوێستانە:

١ـ هەڵوێستی وەلیدی کوڕی عوقبەی کوڕی أبی سفیان (ڕەحمەتی خوای لێ بێت):

ئەو دەرهەق بە حوسێن و وادارکردنی بۆ بەیعەتدان یان کوشتنی، نەهات توندو تیژیو دڵڕەقیو بێ ویژدانی بنوێنێ، بەڵکو گوتی: ...سوێند بێ بەخودا ئەگەر سەروەتو سامانی دونیا هەموو ئەوەی خۆری لە سەر هەڵاتووەو ئاوابووە، حەزم لێ نیە هی من بێ و حوسێنم کوشتبێ ، سبحانەالله! هەر لە بەر ئەوە حوسێن. بکوژم کە دەڵێ: بەیعەت نادەم، لەبەر ئەوە من پێم وانیە کەسێك لە قیامەتداو لە خزمەت خودا لە سەر خوێنی حوسێن

---

١ تأريخ الطبري، نقلا عن الدولة الأموية المفترى عليها (ص: ٣٢٢).

٢ الكامل في التأريخ (٢/٥٨٢).

٣ الأمويون بين الشرق والغرب (١/٢٤٩).

لێپرسینەوەی لە گەڵ بکرێ تا تەرازووی تاوانەکانی سوك بێ[1]. بەم چەشنە وەلید ئەم هەڵوێستە جوامێرانە دەنوێنێ، کە لە کاتێکدا ئەو ئەمیری مەدینەیەو، مسۆگەریش دەزانێ ئەم هەڵوێستەی لە سەری دەکەوێت‌و سەر دەکێشێ بۆ لێخرانی لە پۆستی ویلایەتی مەدینە، بەڵکو زیاد لەمەش سەر دەکێشێ بۆ کوژرانی‌و لە نێوچونی، لە گەڵ هەموو ئەمانەدا لە نێوچونی خۆی‌و دونیای‌و لە دەستدانی پایەی دەسەلات بەسەر ئەوەدا هەڵدەبژێرێ کە سبەینێ‌و لە قیامەتدا بە تاوانی ڕشتنی خوێنی حوسێنەوە بچێتەوە بەر دەستی خوای گەورە[2]. خوا لێی ڕزای بێ‌و ڕازی کا.

٢ــ هەڵوێستی نوعمانی کوڕی بەشیر (خوا لێی ڕازی بێت):

ئەو ئەمیری کوفە بوو، هەواڵی پێگەیشتبوو کە حوسێنی کوڕی عەلی (ڕەزای خوای لێ بێت) دەرچووەو، موسلیمی کوڕی عوقەیلیش گەیشتۆتە کوفەو، بەیعەتی پشتیوانی بۆ حوسێن وەردەگرێت، لەم دەمەدا هەستایە سەرپێ‌و وتارێکی بۆ خەڵك خوێندەوەو، هۆشداری دانێ کە لە دژی ئیمام (خەلیفە) ڕانەپەڕن‌و نەکەن هەوڵی ئاشوب‌و ئاژاوە بدەن، ئەوەی بە یادخستنەوە کە بە هۆی ئاشوبەوە تێکڕای خەڵك بە عەوام‌و دەستڕۆیشتووەوە تووشی ماڵ وێرانی‌و لەنێوچوون دەچن، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا لەگەڵ خەڵك نەرمونیان بوو، هەواڵی دانێ کە ئەو هیچ کەسێك بە گومان‌و تۆمەت ناگرێت‌و، کەسێك شەڕی پێ نەفرۆشێ شەڕی لەگەڵ ناکات، بەڵام ئەو لە کۆتایی وتارەکەیدا توندی کردو بە خەڵکەکەی وت: بەڵام هەر دەمایەك ڕووی دوژمنکارانەی خۆتان بۆ دەرخستم‌و، بەیعەتەکەتان هەڵوەشاندەوەو پێچەوانەی خەلیفەکەتان جوڵانەوە، ئەوا سوێند بەو (ألله)یەی کە بێجگە لە خۆی هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە، ئەگەر کەسیشم بە دەورەوە نەمێنێت‌وبە تاقی تەنیا بکەومە کۆڕێ، هەتا دەستم شمشێر دەگرێ لێتان دەدەم، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هەوادارانی ئومەوی سەبارەت بەم هەڵوێستەی ڕەخنەیان لێ گرتووەو بە لاواز ناویان بردووەو، وتوویانە ئەم هەڵوێستەی تۆ لە بەرانبەر بەرانبەرەکەتدا دەینوێنی هەڵوێستی لایەنێکی دەستەپاچەو چەوساوە نیشان دەدا، نوعمان (ڕەزای خوای لێ بێت) لە وەڵامدا وتی: بەلامەوە لە ژێر سایەی گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەرداری خوادا لە ڕیزی چەوساوان بم، نەوەك لە ژێر سایەی

---

١ تأريخ الطبري (٦/٢٥٩).
٢ الأمويون بين الشرق والغرب (١/٢٤٩).

سەرپێچی‌و شكاندنی فەرمانی خودادا لە ڕیزی بەهێزو دەستڕۆیشتووان بم.[١] .... بێگومان ڕەزامەندی خودای گەورەو بالا، ئامانجێكی هێندە گەورەیە، موسڵمان هەموو شتێكی بە قوربان دەكات‌و، لە پێناوی گەیشتن پێی، هەموو شتێكی گرانبەهاو نایاب بەخت دەكات، چونكە ڕەزامەندی خودا ئەو نازو نیعمەتە مەزنەیە كە خودا بەو مەزنایەتیەی خۆیەوە بە هۆیەوە لە بەهەشتدا خۆی بۆ بەندە ئیماندارەكانی دەردەخات.[٢] خودای گەورەو بە دەسەلات دەفەرمووێت: ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةً فِى جَنَّٰتِ عَدْنٍ ۚ وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٧٢﴾﴾[٣] واتە: خودا بەڵێنی بە ئیمانداران–ی ژن‌و پیاوو نێرو مێ– داوە كە بیانداتێ: چەندین باخ‌و باخات كە لە ژێر درەخت‌و كۆشكەكانی نێویدا ڕووباری زۆر دەڕۆن‌و بە نەمری تێیدا دەژین‌و چەندین كۆشكی خۆش‌و سەركەش لە نێو باخ‌و باخاتگەلێكدا كە قەت كۆتاییان نایەت بۆ هەمیشە تێیاندا نیشتەجێ دەبن، –وێڕای هەموو ئەم نیعمەتە بەرهەستانە– كەمێك لە ڕەزامەندی خودا لە هەر هەموو شتێك گەورەترە، ئا ئەمە سەركەوتن‌وبردنەوەی مەزنە.

٣ــ هەڵوێستی (حوڕی كوڕی یەزید) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت):

(حوڕ) یەكەم كەس بوو لەنێو ڕیزی فەرماندەكانی سوپای كوفەدا بە حوسێن گەیشت‌و نەیهێشت بەرەو ئەو شوێنە بگەڕێتەوە كە لێیەوە هاتبوو، بەلام لەگەڵ ئەمەشدا ڕەفتاری لەگەڵ حوسێندا جوامێرانە بوو، بە حوسێنی وت: من فەرمانم پێ نەكراوە شەڕت لەگەڵ بكەم، بەڵكو فەرمانم بەسەر كراوە هەر كاتێك تۆم دۆزیەوە بەرەو كوفەت بەرم، بەلام پێت دەڵێم: ڕێگایەك دیاری بكە نە بتگەیەنێتە كوفەو نە بەرەو مەدینەت بەرێتەوە، ئەمجا ئەگەر ویستت نامەیەك بۆ یەزید یان ئیبنوزیاد بنووسە، هێندەی نەخایاند سوپای كوفە بە فەرماندەیی عمری كوڕی سەعدی كوڕی ئەبی وقاص گەیشتەجێ، هەدووك لا بەرانبەر یەك وەستان، حوڕ دڵنیا بوو كە شەڕ لەنێوانیاندا دەقەومێ، بۆیە ڕووی لە عمری كوڕی سعد كردو وتی: خوا صالحت بكات! تۆ لەگەڵ ئەو پیاوە بە جەنگ دێی؟ عمر وتی: ئەرێ بە خوا

---

١ تأريخ الطبري (٦/٢٧٧).

٢ الأمويون بين الشرق والغرب (١/٢٥٠).

٣ التوبة (٧٢).

جەنگێکی وای لەگەڵ دەکەم هەرە ئاسانەکەی دەبێ سەری تێدا بپەڕێنو دەستی تێدا بشکێن، لەو دەمەدا حوڕ لە ئەسپەکەی ڕاکێشاو، بەرەو لای حوسێن دەرچوو، پەیوەندی بە ئەوەوە کردو ئەمجا وتی: هۆ خەڵکی کوفە، دەك دایکتان سینگتان بۆ بکوتێو جەرگی بۆتان بسوتێ، حوسێنتان بۆ ئەوە بانگهێشت کردووە کە گەیشتە لاتان ڕادەستی بکەن، ئەی بەدرۆی خۆتان نەتان دەگوت کە لەپێناوی ئەودا شەڕ دەکەین؟- ئێستاش هەڵی دەکوتنە سەرو دەتانەوێ بیکوژن؟- بەربینگتان پێ گرتووەو نایەڵن ڕوو لە وڵاتی بەرفراوانی خودا بکا کەلە سەر سەگەلو ڕەوە بەرازیش قەدەغە نەکراوە؟!، ئێستا کە تینوایەتی بەزەوی داداون، بەبێ ویژدانانە بوونە بەر بەست لە نێوان ئەوانو ڕوباری فوراتداو نایەڵن بچن ئاو بخۆنەوەو تینوایەتی خۆیان بشکێنن. لەحاڵێکدا سەگو بەرازیش بۆیان هەیە بچنە سەریو لێی بخۆنەوە؟. ئێوە خراپترین گەلێکن بۆ نەوەی محمد بە جێ ماون، دەك خودا لە ڕۆژی تینوایەتی گەورەدا ئاوتان نەداتێ ئەگەر لەم ڕۆژەداو لەم ساتە وەختەدا تۆبە نەکەنو لەم گوناهەتان پاشگەز نەبنەوە.

ئەمەو (حوڕ) داوای لە حوسێن کرد لە بەرانبەر هەڵوێستی پێشیدا لێی ببورێ ئەویش لێی بووری، کاتێك هەندێك هاوەڵی لەبەرانبەر ئەوەدا چۆتە پاڵ حوسێن لۆمەیان کرد، وتی: سوێند بەخوا من خۆم لە نێوان بەهەشتو دۆزەخدا سەرپشك دەکەم، بەخوا ئەگەر پارچە پارچە بکرێمو بسوتێنرێم هیچ شتێك بەسەر بەهەشتدا هەڵنابژێرم[١]. حوڕی کوڕی یەزید (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دوای ئەوە هەڵوێستی خۆی لە بەرانبەر حوسێندا گۆڕی، کە بینی حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) باڵی ئاشتی ڕاخستووە، تەماشای کرد، هەڵوێستی دژەبەرەکەی لە بەرانبەر ئەودا هیچ ویژدانێکی تێدا نیە، باشە چۆن دەبێ شەڕ لەگەڵ پیاوێك بکات کە خوازیاری ئاشتییەو دەستی بۆ دوژمنەکەی درێژ کردووە تا صوڵحی لەگەڵ بکات؟ پیاوەتیو شەهامەت وا دەخوازێ کە دەبێ هەڵوێست لە بەرانبەر ئەم کەسە ئاشتیخوازەدا هەڵوێستی هاوکاریو پشتگیری لێکردن بێ، عەقڵیش بڕیاری خۆی دەدا کە هەق بە ئەو کەسەیە کە داوای ئاشتی دەکاتو ئاڵای سپی بۆ هەڵ دەدا، حوڕ چاك دەیزانیو دڵنیا بوو کە لەم بارودۆخەدا هەڵوێستنواندن لە بەرژەوەندی حوسێنو لایەنگریکردنی جگە لە مردن

---

١ تأريخ الطبري (٦/٣٥٥، ٣٥٦).

هیچ ئەنجامێکی تری لێ ناکەوێتەوە، بەڵام ئەو ئەو مەرگەی هەڵبژارد کە بە بەهەشتی دەگەیەنێ.[١] (جعفری کوڕی عفان الطائي)ی شاعیر دەربارەی حوڕی کوڕی یەزید وتوویەتی:

ولم يك فيهم رجل رشيد سوى الحر التميمي الرشيد

فوا حزناه إن بني علي وفاطم قد أبيدوا بالحديد[٢]

٤ـ هەڵوێستی نوواری کچی مالیکی حەزڕەمییە:

(نوار)هاوسەری (خەول کوڕی یەزید) بوو کە عومەری کوڕی سەعد سەری حوسێنی بۆ لای عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد پێدا نارد، کاتێك (خەول )گەیشتەوە کوفە بەرەو کۆشکی ئیمارە چوو، تەماشای کرد دەرگا داخروە، بە خۆی‌و سەری پیرۆزەوە بەرەو ماڵی خۆی چۆوە، سەرەکەی لە ژێر تەشتێك دانا، ئەمجا بەرەو لای هاوسەرەکەی چوو، لەنێو جێگا درێژ بوو، (نوار) پێی وت: چ هەواڵێکت لەلایە؟ (خەول ) وتی: شتێکم بۆ هێناوی هەتا دنیا دنیایە دەوڵەمەندمان دەکات، ئەمە سەری حوسێنە، کە لە ماڵەوەم داناوە، وتی: واوەیلا بۆ تۆ، خەڵك بە زێڕو زیوەوە دێتەوەو تۆش بە سەری کوڕی پێغەمبەری خودا (ﷺ)، نە بە خوا نابێ تا دنیادنیایە ماڵێك سەری منو تۆ پێکەوە کۆ بکاتەوە[٣]. ئەم ژنە لەمێژ بوو چاوەڕێی مێردەکەی دەکرد بێتەوە، بەڵام بە جۆرێك هاتەوە ئاسمانی ڕوونی لێ کرد بە تەم، ئاوی ژیانی لێ لێڵ کرد، چاوەڕوانیە دوورو درێژەکەی لێ تێك دا، ئومێدەوار بوو شووەکەی بە هەواڵگەلێکەوە بێتەوە مژدەبەخش بن‌و دڵی پێیان بکرێتەوەو شادومان بێ، بەڵێ گەڕانەوەی مێردەکەی بە ساغ‌و سەلیمی جوانترین هەواڵێك بوو بۆ ئەو، بەڵام چاویشی لە ئەوە بوو چۆن جەنگاوەران بە دەستی خاڵی ناگەڕێنەوەو عادەتەن زێڕو زیو دەهێننەوە، ئەویش بە دەستی پڕ لە زێڕو زیوەوە بگەڕێتەوە، ئەگەر ئاوا بووایە بە گەڕانەوەکەی‌و ساغ‌و سەلامەتیەکەی دەگەشایەوە، بەڵام ئەو سەری حوسێنی کوڕی پێغەمبەری خودا (ﷺ)ی بۆ لا هێناوە، ئەمجا ئەو هەواڵێکی پێ دەدا کە نیشانەیە لەسەر قایلبوون‌و دڵخۆش بوونی، ئایا دەبێ پەرچەکرداری هاوسەرەکەی چۆن بێ؟ دەبێ ئەمیش وەك شووەکەی بە هەواڵی کوژرانی حوسێن دڵخۆش بێ؟ خۆ ئەگەر ئەم هەواڵەی بە سادەییش بۆ هێنابا بێ شك زۆری پەرۆش دەبوو مەراق دەیگرت، بەڵام ئێستا ئەو کەوتۆتە نێو ئەمری واقیعەوەو هەواڵەکەی

١ الأمويون للوكيل (١/٢٥٢).

٢ كتاب المحن (ص: ١٥٧).

٣ تأريخ الطبري (٦/٣٨٥).

بۆ هێناوەو سەری حوسێنیشی لەبەردەم داناوە، کەواتە زۆر داخدارو نیگەرانتر دەبێ، هەر ئیماندارێك تۆ دەیگری بە بیستنی ئەم هەواڵە دڵتەنگ دەبێو ڕادەچڵەکێ، لەبەر ئەمە (نووار) نێوجێی شوەکەی بەجێ هێشتو سوێندی خوارد نابێ جارێکی تر ماڵێك سەری ئەم لەگەڵ سەری ئەو کۆ بکاتەوە.[1]

## نۆیەم: هەڵوێستی یەزید لە بەرانبەر کوژرانی حوسێنو ڕۆڵەو خانەوادەی حوسێندا:

عبیدالله ی کوڕی زیاد نامەیەکی ئاڕاستەی یەزید کردو، زنجیرەی هەواڵو ڕووداوەکانی پێ ڕاگەیاندنو داوای کردبوو سەبارەت بە ڕۆڵەو خێزانو خانەوادەی حوسێن ڕاو فەرمانی خۆی دەربکات، کاتێك هەواڵەکە بە یەزید گەیشت، گریاو وتی: ئەی خەڵکی عێراق من بەبێ کوشتنی حوسێن بە گوێڕایەڵیو فەرمانبەرداریتان ڕازی بووم، ئا ئەمەیە سەرەنجامی ستەمو ئازاردان، لەعنەتی خودا لە (ئیبنومەرجانە) هیچ خوێنی خزمایەتی بۆ نەجولا، بەڵام بە خودا ئەگەر لەوێ دەبووم لێی خۆش دەبووم، دەك خوا ڕەحم بە حوسێن بکات.[2]

بە گوێرەی ڕیوایەتێکی تر، یەزید وتی: ... بەڵام بە خوا ئەگەر بۆ خۆم لەوێ دەبووم، ئەگەر نیوەی گیانو ژیانی خۆم لەسەر دانابایە پێم خۆش بوو لەسەرم دانابایە، هەر ئەوەندە بمتوانیبایە بەرگری لێ بکەمو نەمهێشتبایە بکوژرێت.[3]

وەڵامی یەزید بە ئیبنوزیاد گەیشتەوەو فەرمانی پێکرد دەستگیرکراوانی بۆ لابەرێ بکات، ئەویش خێرا (ذەکوان–أبوخالد)ی ڕاسپاردو دە هەزاردرهەمی پێدان تا خۆیانی پێ ساز بکەن.[4] لێرەدا پووچەڵیو بێ بنەمایی هەموو ئەو ڕیوایەتانە دەردەکەوێ کە دەڵێن گوایە ئیبنوزیاد خانەوادەی حوسێنی ئازار داوەو بە کۆتو بەندەوە بەرەو شامی بەرێ کردوون،[5] پێشتر خوێندمانەوە کە چۆن ئیبنوزیاد فەرمانی کرد دەستگیرکراوەکان لە شوێنێکی فەراغی شار دابمەزرێنرێنو خواردنو پۆشاکیشی بۆ دابین کردن.[6] بە گوێرەی ڕیوایەتەکەی (عوانة)

---

١ الأمويون بين الشرق والغرب (٢٥٣/١).

٢ أنساب الأشراف بسند حسن (٢١٩/٣، ٢٢٠)، مواقف المعارضة (ص: ٢٨٢).

٣ الاباطيل والمناكير (٢٦٥/١)، للجوزقاني بسند كل رجاله ثقات إلا فيه إنقطاعاً بين الشعبي والمدائيني.

٤ الطبقات (٣٩٣/٥)، مواقف المعارضة (ص: ٢٨٢).

٥ المحن (ص: ١٥٥)، مواقف المعارضة (ص: ٢٨٢).

٦ مواقف المعارضة (ص: ٢٨٣).

(مەحفەزی کوڕی ثەعلەبە) هاوسەرو ڕۆڵەکانی حوسێنی بۆ لای یەزید بردن.[١] کاتێك گەیشتن، فاطمەی کچی حوسێن وتی: ئایا کچانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەبنە کۆیلە؟ یەزید وتی: نەخێر بەڵکو ئازادو سەربەرزو بەڕێزن، برۆ ژوورەوە بۆ لای کچانی مامی خۆت بزانە چیان کردووەو چی دەکەن، فاطمة دەڵێ: جا چوومە لایان یەك ژن‌و کچی خانەوادەی سوفیانم نەبینی کوڵی گریانی هەڵنەستابێ‌و هەنیسکی نەدابێ‌و فرمێسکی لە چاوان نەڕژابێ.[٢] کاتێك عەلی کوڕی حوسێن (زین العابدین) گەیشتە لای یەزید، یەزید وتی: باوکت سیلەی ڕوحمی پساندم‌و ستەمی لێ کردم، بینیت کە خوا چی پێکرد! –شایانی باسە عەلی کوڕی حوسێن بە هۆی ئەوە نەخۆش کەوتبوو نەیتوانیبوو بەشداری جەنگەکەی کەربەلا بکات، بەڵکو لە کاتی جەنگدا لەنێو خێوەت لە جێگادا کەوتبوو، بۆیە لەگەڵ ژن‌و منداڵەکاندا گیراو بۆ لای ئیبنوزیادیان هێنا[٣] – عەلی کوڕی حوسێن بە خوێندنەوەی ئەم ئایەتە وەڵامی یەزیدی دایەوە: ﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَآ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٢٢﴾﴾[٤] واتە: هەر موصیبەتێکتان توش دەبێ لە نەهاتی‌و بێ بارانی‌و نەڕوانی گژوگیاو دانەوێڵەی سەر زەوی‌و نەخۆش بوون‌و لەنێوچوون‌و مەرگی منداڵی خۆتان، هەر هەموو ئەم موصیبەتانەمان لە کتێبی (لوح المحفوظ)دا دیاری کردوون بەر لەوە دروستیان بکەین ، بێگومان ئەمە بە لای خوداوە زۆر ئاسانە.

ئەمجا یەزید داوای لە خالدی کوڕی کرد وەڵامی بداتەوە، خالد نەیزانی چ بڵێ، جا یەزید وتی: پێی بڵێ: ﴿وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُوا۟ عَن كَثِيرٍ ﴿٣٠﴾﴾[٥] واتە: هەر بەڵایەکتان تووش بووە، بەهۆی کردەی دەستی خۆتان بووە، خودا زۆر لەو گوناهانەش دەبورێ. هەندێك لە ڕیوایەتەکان کە زیاتر بە هی شیعە دەچن دەیانەوێ وای بخەنە بەرچاو کە کوڕان‌و کچانی حوسێن خراونە مەزادی کڕین‌و فرۆشتنی ئاشکراوەو، بە درۆی ئەوان گوایە کابرایەکی خەڵکی شام داوای لە یەزید کرد کە یەکێك لە کچەکانی

١ تأريخ الطبري (٦/٣٩٣).

٢ تأريخ الطبري (٦/٣٩٥).

٣ الطبقات (٥/٢١١)، مواقف المعارضة (ص: ٢٧٨).

٤ الحديد (٢٢).

٥ الشورى (٣٠).

حوسێنی پێ بدا.[١] ئەمە درۆیەکی زەقەو هیچ بەڵگەیەکی ڕاستو دروست پشتگیری ناکات، ئەمە هیچ کە ئەوە لەگەڵ هەموو ئەو ڕێزو حورمەتەدا تێك دەگیرێ کە یەزید بۆ خانەوادەی حوسێنی دانابوو، لە لایەکی تریشەوە یەزید نەهاتووە هاوسەرو کچەکانی حوسێن بۆ جەماوەر ڕانوێنێ‌و هەر کەس کامەیان هەڵدەبژێرێ بۆ خۆی بەرێ.[٢] یەزید بۆ لای ئافرەتە هاشمیەکانی نارد پرسیاریان لێ بکەن، هەر کەسێکیان شتێکی لێ سەنراوە با بڵێ‌و، ئیتر بە دوو چەندانە قەرەبوویان بۆ کرایەوەو زیاتریان پێ بەخشرا.[٣] هەروەها یەزید هیچ ژەمێکی بەیانیان‌و ئێوارانی بەبێ عەلی کوڕی حوسێن نەدەخوارد،[٤] وتراوە کە گوایە سەری حوسێن بۆ لای یەزید نێردراوە، بەڵام ئەم ڕیوایەتە نەچەسپاوە، بەڵکو سەری حوسێن هەر لە کوفەو بە لای عوبەیدوڵلاوە مایەوە.[٥]

## دەیەم: گەڕانەوەی خانەوادەی حوسێن بۆ مەدینە:

یەزید بە دوای خزمەتکارە بە تەمەنەکانی بەنی هاشم‌و بەنی عەلیدا نارد لە مەدینە، ئەوانیش هاتن،[٦] دوای ئەوە کە گەیشتن، یەزید فەرمانی بە هاوسەرو کچانی حوسێن کرد خۆیان بۆ گەڕانەوە سازکەن، هەچ شتێکی داوایان کردو داوایان نەکرد پێی بەخشین‌و، تا ئەوەی هەر شتێکیان لە مەدینە پێویست بێ فەرمانی کرد بۆیان دابین بکرێ،[٧] ئەمجا فەرمانی بە نوعمانی کوڕی بەشیر کرد بارگەو بنەیان بۆ بپێچێتەوە.[٨] بەر لەوە بەڕێ بکەون، یەزید بە عەلی کوڕی حوسێنی وت ئەگەر حەزت لێیە لێرە لامان نیشتەجێ بە، صیلەی ڕوحمت بەجێ بگەیەنەو، مافی تۆش لەبەرچاو دەگیرێ‌و حیسابت بۆ دەکرێ،[٩] بەڵام عەلی کوڕی حوسێن گەڕانەوەی بەسەر مانەوەدا هەڵبژارد، بەم چەشنە یەزید ڕێزی لە کوڕەکانی حوسێن گرت‌و سەرپشکی کردن لە نێوان مانەوە لە لای خۆی‌و گەڕانەوە بۆ مەدینە، بەڵام

---

١ تأريخ الطبري (٦/٣٩٢) رواية أبي مخنف.

٢ البدء والتأريخ (٦/١٢)، نووسەری ئەم کتێبە دەڵێ: ڕافیزەکان لەم بەسەرهاتەدا کلك‌و گوێی زۆریان پێوە ناون.

٣ الطبقات (٥/٣٩٧)، تأريخ الطبري (٦/٣٩٥).

٤ الطبقات (٥/٣٩٧).

٥ حقبة التأريخ (ص: ١٤١).

٦ الطبقات (٥/٣٩٧).

٧ الطبقات (٥/٣٩٥)، تأريخ الطبري (٦/٣٩٣).

٨ تأريخ الطبري (٦/٣٩٢).

٩ تأريخ الطبري (٦/٣٩٣)، سير اعلام النبلاء (٤/٣٨٦).

ئەوان گەڕانەوەیان هەڵبژارد.[١] لە کاتی بەجێهێشتنی دیمەشق یەزید داوای لێبوردنی لە عەلی کوڕی حوسێن کردو وتی: یاخوا ئیبنومەرجانە بە نەفرەت بێ، سوێند بە خوا ئەگەر من لە لای ئەو دەبووم حوسێن داوای هەچ شتێکی کردبایە پێم دەداو، بە هەموو توانا‌و تاقەتمەوە مەرگم لێ دوور دەخستەوە، ئەمەم دەکرد ئەگەر بە لەنێوچوونی هەندێ لە کوڕەکانیشم تەواو بووایە، بەڵام وەکو بینیت خودا بە قەزای خۆی کاری کرد، چ شتێکت پێویست بوو بۆم بنووسە.[٢]

یەزید فەرمانی بە هەندێك لە خزمەتکارانی تایبەتی خانەوادەی ئەبو سوفیان کرد تا مەدینە لە خزمەت خانەوادەکەی حوسێندا بن.[٣] کە ژمارەیان سی ئەسپسوار بوو، پێی وتن: لە هەر کات‌و شوێنێك حەزیان لێ بوو پشوو بدەن‌و دابەزن، دایانبەزێنن، هەروەها (محرزی کوڕی حدیثی کەلبی)‌و پیاوێکی دیشی لە هۆزی (بەهرا) لەگەڵ ناردن، کە هەردووکیان لە ڕیزی پیاوە ناودارەکانی شام بوون،[٤] بەم چەشنە خانەوادەی حوسێن بەوپەڕی ڕێزلێنانەوە‌و بە هەموو هۆیەکانی حیساب بۆ کردنەوە، دیمەشقیان بەجێ هێشت‌و گەیشتنەوە مەدینە.[٥] إبن کثیر سەبارەت بە یەزید دەڵێ: ڕێزی تەواوی لە بنەماڵەی حوسێن گرت‌و هەر شتێکی لێیان فەوتابوو زۆر بە زیادەوە بۆی قەرەبوو کردنەوە، کەژاوەیەکی گەورە‌و بە سام‌و هەیبەتی بۆ پێك هێنان‌و بەرەو مەدینەی گێڕانەوە، ئەوە بێ لەوە کە خانەوادەکەی (واتە خاو و خێزانی یەزید)شینێکی گەرمیان بۆ حوسێن گێڕا.[٦]

## یازدەیەم: کێ لە بەرانبەر کوژرانی حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) بەرپرسیارە؟

بەرپرسانی کوژرانی حوسێن چەند لایەنێکن:

١ـ خەڵکی کوفە: ئەوە دانیشتوانی کوفە بوون لێکدا لێکدا نامەیان بۆ حوسێن دەنوسین‌و داوای دەرچوونیان لێ دەکرد، ئەو هێشتا هەر لە مەدینە بوو، لە لایەن ئەوانەوە نامەی بۆ دەهاتن‌و چرای سەوزی پێشوازیان بۆ هەڵکردبوو، ئیدی لەگەڵ ئەم هەموو ئەو هۆشداریانەی

---

١ منهاج السنة (٤/٥٥٩).

٢ تأريخ الطبري (٦/٣٩٣).

٣ الطبقات (٥/٣٩٧)، مواقف المعارضة (ص: ٢٨٦).

٤ الحجة في بيان المحجة (٢/٥٢٥، ٥٢٦)، مواقف المعارضة (ص: ٢٨٦).

٥ مواقف المعارضة في خلافة يزيد (ص: ٢٨٦).

٦ البداية والنهاية، نقلا عن مواقف المعارضة (ص: ٢٨٧).

لە لایەن هاوەڵانەوە بەگوێی دادران کە بە قسەی خەڵکی کوفە نەکات ودەرنەچێ، بەڵام هەر دەرچوو، کاتێك عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد کرا بە والی کوفە خەڵك لە سەرخستن‌و پشتگیری کردنی حوسێن پاشگەزبوونەوە، نەك هەر ئەمە بەڵکو سەرشێتانە چوونە ڕیزی ئەو سوپایەوە کە جەنگیان لەگەڵ کردو کوشتیان: لەبەر ئەمە (حافظ إبن حجر) بەم جۆرە ڕەنگدانەوەی هەڵوێستی کوفەییەکان لە بەرانبەر حوسێندا دەخاتەڕوو، دەڵێ: زۆربەی خەڵکەکە سەریان پێ شۆڕکراو بەزێن‌و بە ترسەوەو بە حەزەوە خۆیان لە پشتیوانی‌و سەرخستنی حوسێن کێشایەوە، کاتێك حوسێن بە خۆی‌و بە هاوەڵانیەوە لەگەڵ سوپاو سەربازانی کوفە لە بەرانبەر یەك ڕاوەستان، حوسێن بەم جۆرە هاواری کردە سەرانی کوفەو وتی: هۆ شبتی کوڕی ڕیبعی، هۆ حیجاری کوڕی ئەبجەر، هۆی قەیسی کوڕی ئەشعەث، هۆ یەزیدی کوڕی حارث! ئەوە ئێوە نەبوون کە بۆتان نووسیبووم: میوەجات ئاڵ‌و بۆڵ بووەو پێگەیشتووە، کانیاوەکان تەقیونەوە، بەڕێ بکەوە سەربازەکانت سازو بازن، وەرە لامان. وتیان: ئێمە ئەوەمان نەوتووەو نەکردووە، جا وتی: سبحان الله، بە خوا ئەمەتان وتووەو کردووە، ئەمجا وتی: ئەی خەڵکینە ئەگەر حەز بە هاتنم ناکەن لێمگەڕێن با بڕۆم ڕووتان لێ وەرگێڕم‌و بچمەوە ئارامگای خۆم.[1] ئەگەر سەرنج لە وتەی هاوەڵان بدەین دەبینین پەنجەی تۆمەت ڕووی لە خەڵکی عێراقەو سەبارەت بە کوژرانی حوسێن ئەوان بە بەرپرسیار دادەنێن، ئەمە (ئومموسەلەمە)یە (ڕەزای خوای لێ بێت) کاتێ هەواڵی مەرگی حوسێن هات خەڵکی عێراقی بە لەعنەت کردو، وتی: کوشتیان خوای گەورەو بە دەسەڵات بیانکوژێت، تەفرەیان داو وەرە وەرەیان کرد نەفرینی خوایان لەسەر بێ.[2] ئەوە (عبدالله‌ی کوڕی عمر)ە (ڕەزای خوای لێ بێت) کاتێك حاجیانی عێراقی سەبارەت بە حوکمی کوشتنی مێش لە حاڵەتی ئیحرامدا پرسیاری لێ دەکەن، دەڵێ: سەرم لێتان دەسوڕمێ ئەی خەڵکی عێراق! (لە لایەکەوە کوڕی کچی پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەکوژن‌و لە لایەکی تریشەوە پرسیار لە خوێنی مێش دەکەن!)[3].

(البغدادي) لە کتێبی (الفرق بین الفرق)دا دەڵێ: ڕافیزەکانی کوفە بە پەیمانشکێنی‌و چروکی بەناوبانگن، هەتا کراوە بە پەندو بە نموونە دەهێنرێنەوە دەوترێ: لە کوفەییش

---

١ انساب الاشراف (٣/٢٢٧)، مواقف المعارضة (ص: ٢٨٨).

٢ فضائل الصحابة (٢/٨٧٢) بإسناد حسن.

٣ مسند أحمد رقم (٥٥٦٨)، إسناده صحيح.

چروکترە، لە کوفەیی ناپاك‌و پەیمانشکێنترە، وەك مەشهورە پەیمانشکێنی ئەوان لە سێ ڕووەوە بە زەقی دەرکەوتووە:

أ- دوابەدوای کوژرانی عەلی (ڕەزای خوای لێ بێت) بەیعەتیان بە (حەسەن)دا، لە ژێر ساباتی مەداین بە ناپاکی دەرهەقی جوڵانەوەو، لە لایەن سەنانی جەعفییەوە غافڵگیر کراو تیرێکی لە چۆکی دراو بە سەختی بریندار بوو.

ب- نامەیان (بە لیژنە) بۆ حوسێن نوسین‌و داوایان لێکرد بێتە کوفە تا بەسەر (یەزید)دا سەری خەن، بە قسەیان هەڵخەڵەتاو بۆ لایان هات، جا کاتێك گەیشتە کەربەلا پەیمانیان شکاندو چوونە گەڵ عوبەیدوڵلاو لەگەڵ تاقمەکەی ئەو بوونە یەك دەست‌و سەرەنجام لە کەربەلا حوسێن‌و زۆرێك لە خزمەکانی حوسێنیان کوشتن.

ج- ئەو پەیمانەشیان شکاند کە بە زەیدی کوڕی عەلی کوڕی حوسێنیان دابوو، ناپاکیان پێ کردو، لە کاتی گەرمەی جەنگدا ڕادەستیان کرد.[١]

بێگومان بەشێکی گەورە لە باری بەرپرسیارێتی کوژرانی حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) دەکەوێتە سەر شانی خەڵکی کوفە کە لە ترسان بەزین‌و پەیمانیان شکاند.

٢- عبیدالله ی کوڕی زیاد:

ملهوڕی‌و زۆرداری‌و گوڕزوەشاندنی بێ بەزەییانەی عبیدالله لەو موافەقەتەوە سەرچاوەی گرت کە لە لایەن یەزیدی کوڕی معاویەی خەلیفەوە ئەرێی بۆ کرا، کاتێك عوبەیدوڵلا هەنگاوی نا بۆ کوشتنی موسلیمی کوڕی عوقەیلی جێگری یەکەمی حوسێن لە کوفەو هانیئی کوڕی عوروەی یەکە بانگخوازی حوسێن‌و سەرۆکی تیرەی موڕادی بەناوبانگی کوفە، یەزید ئەم کارەی ئەوی بە چاك داناو، ڕەخنەی لێ نەگرت، نەك هەر ئەمە بەڵکو سەرسامبوونی خۆی لە بەرانبەر خۆی‌و چۆنیەتی ئەم ستەم‌و گوڕزوەشاندنەی نەشاردەوەو، لە وەڵامی هەواڵنامەکەی ئیبنوزیاددا نوسیبووی: دوای ئەمە، چۆنم پێ خۆش بوو ئاوا جوڵاویتەوە، چالاکیەکی زیرەکانەو پەلامارێکی مارئاساو دڵ قایمانەت ئەنجام داوە، بێ نیازی‌و لێوەشاوەیی خۆت نیشاندا، گومان‌و ڕای منت لە بەرانبەر خۆت بە ڕاست گێڕا.[٢] ئەم پەسندکردنە زیاترو زیاتر پاڵی بە زیادەوە نا بەرەو شەڕو شەڕەنگێزی هەنگاو هەڵێنێ، بە تایبەت کە خودی خۆی لە ناخەوە سروشتێکی شەڕانی هەبوو، ئاراستەیەکی توندوتیژی

---

١ الفرق بين الفرق (ص: ٣٧).

٢ تأريخ الطبري، نقلا عن مواقف المعارضة (ص: ٢٩٣).

گرتبووەبەر، بە خوێنی كاسەی سەری دژەبەرەكانی تینوو بوو، باشە ئەگەر وانیە، چی تێ دەچوو بە توندی بەسەر (شمر)یدا شیڕاندبایەو بەرپەرچی قسەكەی دابایەوەو لەسەر پەسندكردنی ئەو نەخشە ئاشتیخوازو صولحئامێزە بەردەوام بووایە كە حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) خستبوویە ڕوو، بێگومان كاتێك خەڵكانی نەفسنزم دوای ڕوخان بەرز دەبنەوەو، دوای دەستەپاچەبوون‌و سەرشۆڕی جڵەوی دەسەلات دەگرنە دەست‌و دوای مایەپوچی‌و بێبەشبوون دەستیان لە پوڵ‌و سامان گیر دەبێ، لەو دەمەدا حەز ناكەن خەڵكانی نەفسبەرزو شكۆدار لە لایەن خەڵكەوە ڕێزیان لێ بگیرێت‌و حیسابیان بۆ بكرێت، بۆیە دەیانەوێت بیانشكێنن‌و لەو پلەوپایە مەعنەوی‌و مادیانەیان دابەزێنن كە پێیانەوە بەهرەمەندن‌و لەسەر حیسابی شكاندنی ئەوان كەموكوڕی خۆیان پڕبكەنەوەو بە حیساب خۆیان بەرز بكەنەوە، (عوبەیدوڵڵای كوڕی زیاد)یش یەكێك بوو لە ڕیزی ئەو كەسە نەفسنزمانە، كاتێك ئەو لە بەرانبەر حوسێندا بەرانبەر دەكرێ دەبێ چ جۆرە كەسایەتیەكی لێ دەرچێ، بێگومان هەرچەند بە دەسەلاتیش بێ بەلام لە بەرانبەر حوسێندا هەر كەم‌و نزم دەردەچێ، هەر لەبەر ئەمەش بوو حوسێن قایل نەبوو دەستی خۆی بخاتە نێو دەستەوەو، وتی: وەكو كۆیلەی داماو دەستی خۆمیان ناخەمە نێو دەستەوە، كاتێك عمری كوڕی سەعد نامەكەی ئیبنوزیادی پێ گەیشت وتی: بە خوا حوسێن تەسلیم نابێ، ئەو نەفسێكی بەرزی بە عیززەتی كۆڵنەدەر خۆی لە نێوان دوو دەفەی سینگیدا مەلاس داوەو مەحاڵە خۆ بە دەستەوە بدات.[1] عوبەیدوڵڵای كوڕی زیاد والیەكی ستەمكارو دەروونپیس‌و بەدفەڕ بوو، عائزی كوڕی عەمروی موزەنی (ڕەزای خوای لێ بێت) یەكێك بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) چووە لای عوبەیدوڵڵاو پێی وت: ئەی كوڕی خۆم! من لە پێغەمبەری خودا (ﷺ)م بیستووە كە دەیفەرموو: « إِنَّ شَرَّ الرِّعَاءِ الْحُطَمَةُ » واتە: خراپترین شوان ئەو شوانەیە ڕەوە وشترەكانی بە یەكتر دادەداو سەری یەكتریان پێ دەشكێنێتەوە، جا وریا بە تۆ نەبی بە یەكێك لەو جۆرە شوانانە. ئیبنوزیاد وتی: دانیشە، تۆ لە سەركوێزری هاوەڵانی محمدی ، عامر وەڵامی دایەوەو وتی: ئەوان كوا سەركوێزریان تێدا بووە؟، خەڵكانی سەركوێزرو بودەڵەو گرگن‌و بیژۆك لە غەیری هاوەڵان‌و لە دوای چینی ئەوان پەیدا دەبن.[2]

---

١ تأريخ الطبري (٦/٣٤٢).

٢ البخاري رقم (٧١٥٠).

ئیبنوزیاد لە سەری واجب بوو داخوازیەکانی حوسێن جێبەجێ بکاتو ، لێی گەڕابا بەرەو لای یەزید یان هەر شوێنێکی تر ڕۆیشتبا، بەتایبەتی دوای ئەوە کە ئەو بڕیارەیدا نایەتە نێو کوفەوە[١]. (إبن الصلاح)لە (فتاوی)کەیدا دەڵێ: چەسپاوە کە ئەو کەسەی فەرمانی بە کردنی جەنگی حوسێن کردو سەری کێشا بۆ کوشتنی عوبەیدوڵلای کوڕی زیاد بوو.[٢]

یوسف العش دەڵێ: لە سەرمان پێویستە بڵێین: یەکەم بەرپرسیار لە بەرانبەر کوژرانی حوسێندا (شمر)ە، دووەم کەس عوبەیدوڵلای کوڕی زیادە.[٣] بەڵام ئەوەی ڕاستو دروست بێ ئەمەیە بەرپرسیاریەتی یەکەمو تاوانی هەرەگەورە لە بەرانبەر ئەم قەسابخانەیەدا دەکەوێتە ئەستۆی ئیبنوزیاد، چونکە ئەو: هەڵسوڕێنەری هەموو کاروبارەکان بوو و ، پێشنیارەکانی حوسێنی بۆ ئاشتی ڕەفز کردن و، مێژوو هەموو ئەم کارانەی بە تاوان دادەنێو، بە خراپترین شێوە زەمبی دەکاتو، بە لاڕێو ستەمکار ناوی دەبات.[٤]

(الذهبي) لە کۆتایی ژیاننامەکەی عبیدالله‌دا دەڵێ: بابای شیعە مەزەب بەبێ لەعنەت کردنی ئەمو کەسانی لەم نزمتریش ئاسوودە نابێ، ئێمە لەبەر خاتری خودا ڕقمان لێ دەبنەوە و حاشایان لێ دەکەین، بەڵام بە لەعنەتیان ناکەین، بەڵکو حەواڵە بە خودایان دەکەین.[٥]

٣- (عمری کوڕی سعدی کوڕی ئەبی وقاص)ی فەرماندەی سوپا:

خراپترین پاشەوار کە لە باشترین پێشین کەوتەوە، یان کوڕێکی خراپ لە بابێکی چاك کەوتەوە، عمری کوڕی سەعد بوو، ئەو کە فەرماندەی سوپاکە بوو پاشان یەکەیەکەی ئەو سەربازانەی کە لەو پەلامارە بێ ویژدانو بێ بەزەییانەدا بەشدار بوون لە بەرانبەر ڕژانی خوێنی حوسێنو کەسوکارو هاوەڵانیو کوژرانیاندا بە بەرپرسیار دادەنرێن، ئەوانیش دەیانتوانی وەکو (حوڕی کوڕی یەزیدی تەمیمی)ی سەرکردەی یەکەمین مەفرەزەی سوپاکەی عوبەیدوڵلا بۆسەر حوسێن سەنگەریان گواستبایەوەو چووبانایە ڕیزی حوسێنەوە، کە بێگومان ئەمە بۆ ئەوان باشتر بوو، دەبووایە وەکو (حوڕ) بیریان کردبایەوە، ئەو کاتێك تەماشای کرد ئیبنوزیادو هاوەڵانی بە ڕەفزکردنی پێشنیارە صوڵحئامێزەکەی حوسێن بوونە

---

١ مواقف المعارضة (ص: ٢٩٧).

٢ القيد الشريد ورقة (١٣)، مواقف المعارضة (ص: ٢٩٥).

٣ الدولة الاموية (ص: ١٧٢).

٤ عبدالملك بن مروان والدولة الاموية (ص: ١٠٥).

٥ عبدالملك بن مروان والدولة الاموية (ص: ١٠٥).

ستەمکارو دەستدرێژکار، بۆیە لێرە خۆی پێ نەگیراو پەیوەندی بە سەربازگەکەی حوسێنەوە کردو هەتا بە شەهیدی سەری نەنایەوە وازی لە لەسەرکردنەوەی حوێن نەهێنا.[١]

عمری کوڕی سەعد سەرەتا بۆ جەنگی حوسێن دەرنەچووبوو، بەڵکو بە خۆی‌و ئەو چوار هەزار جەنگاوەرەی لەگەڵیدا بوون، بۆ جەنگی دەیلەم سازکرابوون ، جا کاتێك ئیبنو زیاد هەواڵی بەرێکەوتنی حوسێنی پێ گەیشت، بە عمری گووت: شەڕ لە گەڵ حوسێن بکە، کە تەواو بووی بەرەو (دەیلەم) بادەوە، جێگەی باسە ئیبنو زیاد عمری کردبوو بە والی (ڕەی)، عمر داوای لە ئیبنو زیاد کرد کەسەبارەت بەجەنگی گەڵ حوسێن عەفوی بکا، بەڵام ئیبنو زیاد هەڕەشەی لێ کردو وتی کە کە ئەگەر ئەمەنەکات لە پۆستی والیایەتی (ڕەی) دەخا، ئیدی (عمر) قسەکەی خۆی خواردەوەو پاشگەز بۆوەو پێی گوت: تا تۆزێك بیری لێ دەکەمەوە ، ئەمەو سەبارەت بەئەمە ڕاوێژی بەخەڵك دەکرد هەر هەموویان ئامۆژگاریان دەکرد لە دژی حوسێن دەرنەچێ، (هەمزەی کوڕی موغیرەی کوڕی شوعبە)ی خوارزای پێی گوت:خودات بەگژدا دەکەم ئەی خاڵی خۆم، نەکەی بەرەو جەنگی حوسێن نەڕۆی دەنا لەلایەن پەروەردگارتەوە تاوانبار دەبی‌و صیلەی ڕوحم‌و خزمایەتیشت دەپچڕێ، وەڵڵاهی ئەگەر هەرچی هەتە لە دنیادا لە سامان‌و دەسەڵات لە دەستت دەرچێ زۆر باشترە لەوەی بەخۆت‌و خوێنی حوسێنەوە، بەخزمەت خودا بگەیتەوە[٢]. جا عمر گوتی: إنشاءالله بە قسە دەکەم . لەگەڵ هەموو ئەو ئامۆژگاریانەی پێشکەشی کران ونەو ترساندنانەی پێشانی دران تا ئەم کارە ئەنجام نەدا ، بەڵام سوودی نەبوو ، چونکە دەروونی عمری کوڕی سەعد هێند پەیوەست بوو بە دنیاو پۆستی ئیمارەتەوە و نەیتوانی خۆی لێ بپچڕێتەوە، هەق وایە بوترێ: ئەو ویستی بە ئیجتیهادی خۆی لەم نێوانەدا هەم دەستبەرداری پۆستەکەی نەبێ‌و هەم هەولێش بدات کەلێنێك بدۆزێتەوەو پاشان خۆی لە جەنگی حوسێن‌و هاوەڵەکانی بدزێتەوە، بەڵام لەم کارەیدا سەرکەوتوو نەبوو.

دنیاخوازان لە پێناو گەیشتن بە دنیا سیفەتە جوانەکانی جوامێری‌و پیاوەتی‌و بەخشندەیی لەبیر دەکەن، بەڵکو لەهەموو ئەمانەش گەورەتر فەرامۆش دەکەن کە بریتیە لە لێپرسینەوەی قیامەت‌و وەستان لە بەرانبەر خودای گەورەو بە دەسەڵاتداو لێپێچنەوە لە هەر هەموو ئەو کردەوانەی ئەنجامیان دەدەن، بەڵکو شتە بەلگەنەویست‌و حاشا

١ عبدالملك بن مروان والدولة الاموية (ص: ١٠٥).
٢ تأريخ الطبري (٦/٣٣٥).

هەڵئەگرەکانیش پشتگوێ دەخەن، وەك لەنێوچوونی دونیاو وەرگەڕانی تەختی دەسەڵاتو لەدەستچوونی پۆستی مەعنەویو مادی سەڵتەنەت. ئەگەر عمری کوڕی سەعد بهاتبایو قوربانی بە پۆستەکەی دابایەو گوێڕایەڵیو فەرمانبەرداری بۆ خودا ئەنجام دابایە دەیتوانی گرەوی خۆی بەرێتەوەو ناوی خۆی لەڕیزی ناپاکانی ستەمکار هەژمار نەکات، لە تۆماری دەستدرێژیکارانی تاوانبار تۆمار نەکات، ئەگەر ئەو ئەم هەنگاوەی هەڵێنابا ئەوەی خودا لە بەهرەو نازو نیعمەتەکانی دنیادا بۆی نووسیبوو هیچی لە دەست نەدەچوو، بە لای خوداوە لە ڕیزی چاکەکارانو صاڵحان دادەنرا.[1]

٤ـ یەزیدی کوڕی معاویە:

یەزید بە ڕواڵەت کوژرانی حوسێنی پێ ناخۆش بووەو، هەوڵی دابوو نەهێڵی دەربچێ، نامەی بۆ عبداللهی کوڕی عباس نووسیبوو، داوای لێ کردبوو، کە ڕێگە نەدا حوسێن دەربچێ، کاتێکیش سەری پیرۆزیان لەبەر دەست دانا، وتی: یاخوا ئیبنو مەرجانە (واتە عوبەیدوڵای کوڕی زیاد) بە لەعنەت بێ، ئاخر من بەبێ کوژرانی حوسێن لە فەرمانبەرداریەکەتان ڕازی دەبووم، بەڵام وەڵڵاهی ئەگەر من لە لای دەبووم، چاوپۆشیم لێ دەکردو لێی خۆش دەبووم.[2]

بێگومان گریان لەسەر حوسێنو نەفرینکردنی ئیبنومەرجانە ڕەخنەو سەرزەنشت لەسەر یەزید سوك ناکاتو لە ڕیزی ئەو تاقمەی ناهێنێتەدەر کە دەستیان بە خوێنی حوسێنو هاوەڵانی سوور بووە، چونکە ئەو دەبووایە نزیکبوونی حوسێنی لە پێغەمبەری خودا (ﷺ)و جێگەو پێگەی ئەوی لە دڵو دەروونی موسڵماناندا لەبەرچاو گرتبایەو، ئیتر لەم ڕوانگەیەوەو بە خاتری ئەمە دەیتوانی بە ڕاشکاویو بێ پێچو پەنا فەرمانی بە ئیبنوزیاد کردبایە کە بە هیچ کلۆجێك خۆ لە قەرەی کوشتنی حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) نەداتو، بەو پەڕی داناییانەو ژیرانە هەڵسوکەوتی لەگەڵ ئەنجام بدات.[3]... بێگومان بەرپرسیاریەتی کوژرانی حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) ڕاستەوخۆ دەکەوێتە سەر شانی یەزید، چۆن وانیە کە لە کاتێکدا دەبینین لە سەردەمی خیلافەتی خودی یەزیداو لەسەر ئەو خاکە کوژراوە کە لە ژێر قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی ئەودا بووەو سوپای ئەو تێیدا باڵادەست بووە، ئەوە عمری کوڕی خەطابی ئەمیری ئیماندارانە (ڕەزای خوای لێ بێت) ئۆباڵی هەڵەنگوتن یان سەرسمبردنی

---

١ الأمويون بين الشرق والغرب (١/٢٤١).

٢ أنساب الأشراف (٣/٢١٩، ٢٢٠).

٣ العالم الاسلامي في العصر الاموي (ص: ٤٧٨).

ولاّخێك لە خاکی شام یان عێراقدا دەخاتە ئەستۆی خۆی، هەر بەحوکمی ئەوە ڕێگاکەی بۆ خۆش نەکردوە، ئەی باشە ئەگەر بکوژەکان سەربازی ئەمیری ئیمانداران بن حیسابەکە چۆن دەبێ؟[1] ، لەڕاستیدا کوژرانی حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) نیشانەیەکی نەنگو مۆرێکی ڕەشە بە نێوچەوانی سەردەمەکەی یەزیدی کوڕی معاویەی کوڕی ئەبی سوفیانەوەو هەرگیز لێی نابێتەوە.

## دوازدەهەم: ڕای خەڵك لە سەر یەزید ئایا دروستە بە لەعنەت بکرێ؟

خەڵك سەبارەت بە یەزیدی کوڕی معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان بوون بە سێ لایەن واتە دوولاو ناوەڕاستێك، یەکێك لەو دوولاتەنیشتە کە دەڵێ: یەزید کابرایەکی بێ باوەڕو دوو ڕوو بوو، هەوڵیدا لە ڕێی کوشتنی جگەر گۆشەی پێغەمبەری خودا (ﷺ)ەوە دڵودەرونی خۆی ئاوبدات و، لە بەرانبەر کوژرانی عوتبەی باپیریو شەیبەی برای باپیریو وەلیدی کوڕی عوتبەی خاڵیو غەیری ئەمانیش بەدەستی عەلی کوڕی ئەبو تالیبو هاوەڵانی تر لە جەنگی بەدردا تۆڵەی خۆی لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بکاتەوەو بەمەش شیفای دڵی خۆی بدات، هەر ئەم لایەنە دەڵێن: ئەم –کوشتنەی حوسێن– بریتیە لە ڕقو قینەی جەنگی (بەدر)و شوێنەواری سەردەمی جاهیلیو سەبارەت بەمە ئەم هۆنراوە بە دەم یەزیدەوە دەخوێننەوە:

لما بدت تلك الحمول وأشرفت ... تلك الرؤوس على ربي جيروني
نعق الغراب فقلت نـح أولا تنح ... فلقد قضيـت مـن النبي ديوني

هەروەها دەڵێن گوایە یەزید بەو شیعرەی إبن الزبعري نموونەی هێناوەتەوە کە لە کاتی جەنگی ئوحوددا هەڵی بەستبوو وتبووی:

ليـت أشيـاخي ببـــدر شهدوا ... جــزع الخــزرج من وقع الأسل
قد قتلنا كثـيراً من أشياخهم ... وعدلنـــاه ببـــدر فـاعتـدل[2]

بێگومان قسەگەلێکی لەم جۆرە بۆ ڕافیزە زۆر ئاسانە، ئەوان کە بە کافردانانی (أبوبکرو عمرو عثمان)یان بە لاوە ئاسان بێ ئەوا بە کافردانانی یەزیدیان زۆر بە لاوە ئاسانترە.

لایەنی دووەم: بە لای ئەوانەوە یەزید پیاوێکی صالحو پێشەوایەکی دادپەروەر بووەو، لە ڕیزی ئەو هاوەڵانە بووە کە لە سەردەمی پێغەمبەری خودا (ﷺ)دا لە دایك بوونو، پێغەبەر (ﷺ) بە دەستی خۆی هەڵی گرتووەو نزای فەڕی بۆ کردووە، هەندێك لەنێو ئەو

---

[1] الأمويون بين الشرق والغرب (١/٢٤٥).
[2] الفتاوى (٤/٢٩٤).

تاقمەدا دەڵێن لە أبوبکرو عمر شکۆدارتر بووەو، لەوانەیە هەندێکی تریشیان بە پێغەمبەری دابنێن، ئەوان بە درۆو بە بوختان لەسەر زاری (شێخ عەدی) یان (حەسەنی مەقتول) وتوویانە: حەفتا وەلی ڕوویان لە قیبلەوە بەرەو یەزید وەرسوڕاند تا لەگەڵیدا بن، ئەمە قسەی عەدەویە زێدەڕۆکانەو هاوشێوە گومڕاکانیانە، بێگومان (شێخ عەدی) پیاوێکی خواپەرست‌و چاك‌و صالحی ئومەوی بوو، هەروەك شێخ (أبوالفرج المقدسی) سەبارەت بە ئەو دەڵێ: لە ئەوەوە نەزانراوە کە بێجگە بەرەو سوننەت بەرەو شتێکی تری بانگهێشت کردبن ، بێگومان عەقیدەو بیروباوەڕی لەگەڵ سوننەت هاتووەتەوە، بەڵام شتگەلێکیان بە درۆ داوەتە پاڵ سوننەت‌و حەدیثی هەڵبەستراویان هێناون‌و، زیادەڕۆییان لە مەتح‌و باڵابردنی شێخ عەدی‌و یەزیدو، زەمبکردنی ڕافیزەدا کردووەو وتوویانە: ڕافیزە قەت تۆبەیان لێ قبوڵ ناکرێت‌و، چەند شتی تریشیان لەسەریان هەیە، بێگومان لە ڕوانگەی هەر یەکێك کە کەمێك ژیری هەبێت‌و لە کاروباران بزانێت‌و شارەزای گوزەرانی پێشینان بێ! تێ دەگات کە ڕای هەر یەکێك لەم دوو لایەنە پووچ‌و بێ بنەمایە، لەبەر ئەمە ئەم دوو ڕایە نادرێنە پاڵ هیچ کەس‌و تاقمێك کە ئەهلی عیلمن و سوننەتدۆست بن، هەروەك ناخرێنە پاڵ خەڵکانێك بەئاوەز و خاوەنڕا بن.[1]

ڕای لایەنی سێیەم: یەزید پاشایەك بوو لە ڕیزی پاشایانی ئیسلام، چاکەی هەبوون‌و خراپەشی هەبوون، بێباوەڕ نەبوو، بەڵام بە هۆی ئەوەوە بوو کە کارەساتی کوژرانی حوسێن لە سەردەمی ئەودا ڕووی داو، ئەوەی بۆی کرا لەبەرانبەر (ئەهلی حوڕڕە)دا کردی، نە هاوەڵ بووەو نە لە ڕیزی وەلیە صالحەکانیشدا بووە، ئەمە ڕای گشتی ئەهلی عەقڵ‌و عیلم‌و سوننەت‌و جەماعەتە، ئەمجا لێرەدا بوونەتە سێ تاقم: تاقمەیەك بە لەعنەتی دەکەن، تاقمەیەك خۆشیان دەوێ، تاقمەیەکیش نە جنێوی پێ دەدەن‌و نە خۆشیان دەوێ، ئەم ڕای سێهەمە لە لایەن ئیمام ئەحمەدەوە دەقی لەسەرەو هاوەڵانی میانەڕەوی ئەوو باقی موسڵمانانیش لەسەر ئەم بیروڕایەن، صالحی کوڕی ئەحمەد دەڵێ: بە باوکم وت: خەڵکێك دەڵێن: کە ئەوان یەزیدیان خۆش دەوێ، لە وەڵامدا وتی: ڕۆڵەگیان، ئایا کەسێك باوەڕی بە خوداو ڕۆژی پەسڵان هەبێ یەزیدی خۆش دەوێ؟ وتم: ئەی باوکە، بۆ لەعنەتی لێ ناکەی؟ وتی: ئەی کوڕی خۆم، کەی باوکت بینیوە لەعنەتی لە کەس کردبێ. هەر لەم بارەیەوە (صالح) دەڵێ: سەبارەت بە یەزیدی کوڕی معاویە پرسیارم لە ئەحمەد کردو ئەویش لە

---

١ الفتاوی (٤/٢٩٥).

وەڵامدا وتی: ئەو بوو ئەوەی بۆی کرا لە مەدینەدا کردی، وتم: چی کرد؟ وتی: لە هاوەڵانی پێغەمبەری خودا (ﷺ)ی کوشتو کردیو کردی، وتم: چی کرد؟ وتی: مەدینەی تالآن کرد، وتم: جا دروستە قسە دەربارەی ئەو بکرێ؟ وتی: نا، هیچ قسەیەك دەربارەی ئەو ناکرێ. بەم جۆرە قازی (أبو یعلی)و غەیری ئەویش ئەمە دەڵێن.[1]

کاتێك سەبارەت بە یەزید پرسیار لە (أبو محمد المقدسی) کرا ، وتی: ئەوەی لە زانایانەوە بە من گەیشتبێ نە جوێنی پێ دەدرێو نەخۆشیش دەویسترێ، هەروەها (إبن تیمیة) دەڵێ: سەبارەت بە یەزید پرسیار لە (أبو عبدالله‌ی کوڕی تیمیة)ی باپیرمان کراوەو، ئەویش لە وەڵامدا وتوویەتی: نە کەم دەکاتو نە زیاد دەکات. ئا ئەمە جوانترینو دادپەروەرانەترین ڕاوبۆچوونە لەسەر یەزیدو هاوشێوەکانی، سەبارەت بە قسە پێنەوتن و نەفرین نەکردنیشیەوە، لەبەر ئەوەیە کە فاسق بوونەکەی بەو شێوە نەچەسپاوە تا موستەهەقی لەعنەت کردن بێ، یان لەسەر ئەو بنەمایەیە کە نابێ فاسقی دیاریکراو لەبەر تایبەتمەندبوونەکەی خۆی بە فیسقەکەیەوە نەفرین بکرێ، جا یان لەبەر حەرامبوونی خودی لەعنەت، یان بە شێوەی خۆپاك ڕاگرتنو خۆپاراستن لە لەعنەتکردن، هەروەك چۆن لە (صەحیحی بوخاری)یداو بە ڕیوایەتی عمر، لە بەسەرهاتی (حمار)دا هاتووە: کاتێك (حمار) چەندجار مەی خواردنەوەی دووبارە دەکردەوەو شەلاق لێدانیشی لەسەر نوێ دەبۆوە، هاوەڵێك بە لەعنەتی کرد، پێغەبەر (ﷺ) فەرمووی: (لا تَلْعَنْهُ ؛ فإنَّه يُحِبُّ اللهَ ورسولَه)[2] واتە: بە لەعنەتی مەکە، چونکە ئەو خوداو پێغەمبەری خودای خۆش دەوێن. هەروەها دەفەرموێت: (لَعْنُ الْمُؤْمِنِ كَقَتْلِهِ)[3] واتە: بە لەعنەتکردنی ئیماندار وەکو کوشتنی وایە، ئەمە لەگەڵ ئەوەدا کە لە پێغەمبەری خودا (ﷺ)ەوە چەسپاوە بە شێوەی گشتی لەعنەتی لە مەیخۆرەوان کردووە. بەڵام بە گوێرەی ئەم فەرمایشتە (صحیح)و ڕاستو دروستەش بەری بە لەعنەتکردنی مەیخۆرەوەیەکی دیاریکراو گرتووە، وەك دەبینین دەقەکانی هەڕەشە بە نیسبەت کەسانێك کە ماڵو سامانی هەتیوان دەخۆنو زینا دەکەنو، دزی دەکەن، بە شێوەیەکی گشتی هاتوونو بۆمان نیە ئەم حوکمە گشتیانە بەسەر کەسێکی دیاریکراودا بچەسپێنینو بڵێین دۆزەخیە، بە حوکمی ئەوە دروستە شتێکی پێ ڕابگات، وەکو تۆبەکردن،

---

١ الفتاوى (٤/٢٩٥).
٢ البخاري رقم (٦٧٨٠).
٣ البخاري رقم (٦٦٥٢).

یان چەند چاکەکردنێك، یان چەند موسیبەتێك کە بۆی دەبن بە مایەی سڕینەوەی گوناهەکانی، یان شەفاعەتێکی قبوڵکراو، یان هەر شتێکی تری لەم بابەتانە.[١]

ئەوانەش کە لەعنەتکردنی بە ڕەوا دادەنێن پێیان وایە:وازهێنان لە لەعنەتکردنی (یەزید) وەکو ئەوە وایە واز لە تەواوی شتە موباحو ڕێگەپێدراوەکان بهێنی وەك قسەی زیادە، هەڵبەتە لەبەر ئەوە نا کە لەعنەتەکە مەکروهە، بەڵام سەبارەت بە تەخرکردنی خۆشەویستی یەزید: چونکە خۆشەویستی تایبەت تەنها بۆ پێغەمبەرانو ڕاستانو شەهیدانو صالحانەو، ئەویش لە ڕیزی هیچ کامێکیاندا نیە، پێغەبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ))[٢] واتە: مرۆڤ دەچێتە ڕیزی ئەو کەسەی کە خۆشی دەوێ. هەر کەسێکیش باوەڕی بە خوداو بە ڕۆژی دوایی هەبێ، حەز ناکات یەزیدو هاوشێوەی ئەو لە پاشا نادادپەروەرەکان هەڵبژێرێتو بچێتە ڕیزی ئەوانەوە، سەبارەت بە تەخرکردنی خۆشەویستی یەزید دوو ڕەخنە هەن تا بکرێنە بیانوو:

یەکەم: کردارێکی وا جوانو پەسندو چاکی لێ دەرنەچووە کە خۆشەویستی ئەو پێویست بکات، ئەو هەروەك یەك لە پاشا خۆسەپێنەکان ژیا، کەواتە خۆشویستنی کەسانی لەم جۆرە شەرعی نیە، ئەم ڕەخنەو ڕەخنەی ئەو کەسەش کە بە لای ئەوەوە شتێکی وای بۆ دەرنەکەوتووە فاسقایەتی یەزید سابت بکات، پێم وابێ تەئویلەو بەس.

دووەم: کردارگەلێکی وای لێ دەرکەوتوون کە سەر بۆ ئەوە دەکێشن هەم بە ستەمکار دابنرێو هەم حیسابی فاسقی بۆ بکرێ لە ژیانیدا، وەك ئەو کارەساتەی بەسەر حوسێندا هێنراو ئەو ڕەفتارەی دەرهەق ئەهلی حوڕڕە ئەنجام درا.[٣]... ژمارەیەك لە زانایان وەکو أبو الفرج الجوزيو الكياهراسي[٤] و هی تریش کاتێك کردەوەکانی یەزیدیان تەماشا کردووەو بۆیان دەرکەوتووە بە هۆی ئەم کردەوانەوە دروستە بە لەعنەت بکرێ، هاتوون بە لەعنەتیان کردووە، ئەمجا لەسەر ئەم بنەمایە وتوویانە: ئەو فاسقە، هەموو فاسقێکیش دروستە بە نەفرەت بکرێ، بە بۆچوونی ئەمانە بابای سەرپێچیکار ئەگەر حوکمی فاسق بوونیشی بەسەردا نەدرێ بە نەفرەت دەکرێو، هەرچەندە فاسقگەل بە تێکڕایی بە نەفرەت ناکرێن بەڵام بە هۆی تایبەتمەندبوونی بە ئەنجامدانی گوناهە گەورەکانیەوە نەفرەت دەکرێ،

---

١ الفتاوى (٤/٢٩٦).

٢ البخاري رقم (٦١٦٩).

٣ الفتاوى (٤/٢٩٦).

٤ الكياهراسي: عەلی کوڕی محمدی طبري، بە عمادالدين ناسراوەو ساڵی ٥٠٤ك مردووە.

هەروەك چۆن پێغەمبەری خودا (ﷺ) بە شێوەی تێکڕا هەموو تاوانبارو سەرپێچیکارانی بە نەفرەت نەکردن، بەڵام هاتووەو چەندین کەس‌و جۆری لە یاخیبووان‌و سەرپێچیکاران بە تایبەت بە نەفرەت کردووە، ئەمەی ڕابووری سێ بەڵگەو بیانوو بوون لەسەر بە لەعنەتکردنی یەزید.[1]

هەندێك لە زانایانی وەك غەزالی‌و دستی‌و هی تریش کە خۆشویستنی یەزیدیان شەرعاندووە، یان خۆشیان ویستووە دوو بەڵگە دەهێننەوە:

یەکەم: ئەو موسڵمان بووەو لە سەردەمی هاوەڵان‌و شوێنکەوتوواندا وەلی ئەمری ئوممەت بووەو خاوەنی چەند سیفەتێکی پەسندیشە، دەربارەی ڕووداوی (حوررە)و چەند هەڵوێستێکی تریشی کە نواندوونی‌و ئەنجامی داون لێکدانەوەی خۆی هەبووە لەسەریان. ئەم تاقمە دەڵێن: یەزید لەم بوارەدا ئیجتیهادی کردووە بەڵام نەیپێکاوە. هەروەها دەڵێن: یەکەمجار خەڵکی حوررە بەیعەتەکەی ئەویان هەڵوەشاندبۆوەو، (عبداللەی کوڕی عمر)و غەیری ئەویش سەبارەت بەم هەڵوێستەیان ڕەخنەیان لێ گرتبوون، بەڵام دەربارەی کوژرانی حوسێن، یەزید فەرمانی پێ نەکردبوو، پێشی ڕازی نەبووە، بەڵکو لەگەڵ گەیشتنی هەواڵی کوژرانی حوسێن ناڕەحەتی لێ دەرکەوتووەو، زەمبی خودی کوشتنەکەی کردووەو، سەری حوسێنیشی بۆ لا نەبراوە، بەڵکو تەنها بۆ لای ئیبنوزیاد براوە.

بەڵگەی دووەم: لە صەحیحی بوخاریداو چەسپاوە، کە عبداللەی کوڕی عمر دەڵێ: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (أَوَّلُ جَيْشٍ مِنْ أُمَّتِي يَغْزُونَ مَدِينَةَ قَيْصَرَ مَغْفُورٌ لَهُمْ )[2] واتە: یەکەم سوپا کە جەنگی (قوستەنتینیە)ی شاری قەیصەر(ڕۆم) دەکات خوا لێیان خۆش بووە، دیارە یەکەم سوپاش کە جەنگی قوستەنتینیەی کرد ئەوا یەزید فەرماندەکەی بوو، لە ڕاستیدا ئەم دوو بەڵگەیە دروستە ئیجتیهادیان تێدا بکرێ، بە هەمان شێوە خۆشویستنی کەسێك کە هەم کاری چاکە بکات‌و هەم ڕەفتاری خراپەش بنوێنێ، ئەمە بە لای ئێمەوە[3] دژایەتی دروست ناکا، کەسێك موستەهەقی ستایش‌و گازندەو پاداشت‌و سزا بێ، یان لە لایەکەوە نزای خێری بۆ بکرێت‌و ڕەحمەت باران بکرێ لە لایەکی تریشەوە توك‌و قسەی ئاڕاستە بکرێن‌و نەفرینباران بکرێ، ئەمە بەو پێوودانەی کە لە هەردووك ڕووەوە

---

١ الفتاوى (٤/٢٩٧).

٢ البخاري رقم (٢٩٢٤).

٣ الفتاوى (٤/٢٩٧).

موستەهەقە. ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت لەسەر ئەوە کۆکن کە: فاسقانی سەر بە ئۆممەت ئەگەر بچنە نێو دۆزەخەوە یان موستەهەقی چوونە نێو دۆزەخیش بن ئەوا لە دواییدا هەر دەچنە بەهەشت و سزاو پاداشتیان لەسەر کۆدەبنەوە، بەڵام خەواریج‌و موعتەزیلە ئەمە ناسەلمێنن‌و پێیان وایە کەسێك موستەهەقی پاداشت بێ موستەهەقی سزا نابێت‌و، کەسێکیش موستەهەقی سزا بێ موستەهەقی پاداشتیش نابێت،[1] بەڵام سەبارەت بە جائیزبوونی نزای خێرو تووکی شەڕ بۆ کەسێك... ئەوا مردووگەلی موسڵمان بە چاك‌و خراپیانەوە نوێژیان لەسەر دەکرێ، ئەگەرچی بابای تاوانبار لەبەر خودی یان جۆری خۆی بەر لەعنەتیش بدرێ، بەڵام حاڵەتی یەکەم ناوەندگیرو دادپەروەرانەترە، هەر بەم جۆرەش إبن تیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) وەڵامی (بۆلای)ی سوپاسالاری مەغۆلی دایەوە کاتێك لە پەلامارە گەورەکەیاندا هاتە دیمەشق گفتوگۆو مشتومڕ لە نێوانیاندا دروست بوو. (بۆلای) پرسیاری لە (إبن تیمیة) کرد: دەربارەی یەزید چ دەڵێن: وتی: نە جوێنی پێ دەدەین‌و نە خۆشمان دەوێ، ئەو هێندە پیاوێکی صالح نەبووە هەتا خۆشمان بوێت‌و، کەسیش لەنێو موسڵماناندا تاك ناکەینەوە تا بیکەین بە نیشانەی تیری جوێن‌و نەفرەت. وتی: ئەی لەبەرچی بە لەعنەتی ناکەن؟ ئەی ستەمکار نەبوو؟ ئەو حوسێنی نەکوشت؟! (إبن تیمیة) دەڵێ: پێم وت: کاتێك لە لای ئێمە باسی ستەمکارگەلێکی وەك حەجاجی کوڕی یوسف‌و هاوشێوەکانی بکرێ، خودا چ دەفەرمووێت ئێمەش ئەوە دەڵێین: ﴿أَلَا لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ﴾[2] واتە: ئاگادار بن دەك لەعنەتی خودا بەسەر ستەمکاراندا بباریێ. ئێمە حەز ناکەین کەسێك بە خودی خۆی دیاری بکەین‌و بە لەعنەتی بکەین، هەرچەندە تاقمەیەك لە زانایان بە لەعنەتیشیان کردبێ، ئەم بابەتە ئیجتیهاد هەڵدەگرێ، بەڵام بە لای ئێمەوە ئەم ڕایە بە لامانەوە جوان‌و خۆشەویستترە. سەبارەت بە ئەو کەسەی حوسێنی کوشتووەو یارمەتی کوشتنەکەی داوە، یان پێی خۆشحاڵ بووە، ئەوا دەڵێین: دەك بەر لێزمەی نەفرەتی خوداو فریشتەکان‌و خەڵك بکەوێ‌و، نە واجبی لێ وەربگیرێت‌و نە سوننەتی لێ قبوڵ بکرێ، (بۆلای) وتی: ئەی (ئالوبەیت)تان خۆش دەوێ؟ (إبن تیمیة) دەڵێ: وتم: خۆشویستنی ئەوان بە لای ئێمەوە واجبەو پاداشتی لەسەر دەدرێتەوە، لە لای ئێمەو لە صەحیحی موسلیمداو لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە، وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە غەدیر

[1] الفتاوی (٤/٢٩٧).

[2] هود (١٨).

کە بە خوم ناودەبرێو لە نێوان مەککەو مەدینەدا هەڵکەوتووە، وتاری بۆ داینو فەرمووی:((أَيُّهَا النَّاسُ: إِنِّي تَارِكٌ فِيكُمُ الثَّقَلَيْنِ كِتَابَ اللَّهِ)) واتە: ئەی خەڵکینە من دوو شتتان لەنێودا بەجێ دەهێڵم: کتێبی خودا، ئیتر باسی کتێبی خودای کردو داکۆکی زۆری لەسەر کرد، دوایی فەرمووی: ((وَعِتْرَتِي أَهْلَ بَيْتِي))[1] واتە: وە خێزانو نەوەکانم. لە نوێژەکانماندا دەڵێین: ((اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ ))، واتە: دەڵێین: خوایە بارانی ڕەحمەتو بەرەکەتی خۆت بڕژێنە بەسەر محمدو ئالوبەیتی محمد، هەروەك چۆن ڕژاندووتە بەسەر ئیبراهیمدا، بە ڕاستی سوپاسگوزارو شکۆداری.

وتی: ئەی کێ ڕقی لە ئەهلوبەیتە؟ (إبن تيمية) وتی: یاخوا هەر کەسێك ڕقی لێ دەبنەوە بەر تاوە لێزمەی لەعنەتی خوداو فریشتەکانو خەڵك بکەوێو، نە فەرزی لێ قبوڵ بکرێو نە سوننەتی لێ وەربگیرێ، ئەمجا (إبن تيمية) ڕووی لە وەزیرەکەی مەغۆل کردو پێی وت: ئەم کابرایە بۆچی ئاوا دەربارەی یەزید پرسیاری دەکرد، خۆ ئەو تەتەرە؟ وتی: پێیان وتبوو: خەڵکی دیمەشق (ناصبة)ن، (إبن تيمية) بە دەنگێکی بەرز وتی: ئەوەی ئەمەی وتووە درۆی کردووە، هەر کەسێك ئەم درۆیەی کردووە بەر لەعنەتی خودا بکەوێ، وەڵڵاه لە دیمەشقدا یەك ناصبەش نیە، بە کەسم نەزانیوە ناصیبی بێ، خۆ ئەگەر بێتو کەسێك لە دیمەشقدا بە خراپە باسی عەلی بکات موسڵمانان لە دژی ڕاست دەبنەوە،[2] لێرەدا پێویستە ئەوە بزانین کە هەتا دەوڵەتی عەباسی بەرپا نەبوو دەرفەتی لێدانی (بەنی ئومەییە) پەیدا نەبوو، بە لەعنەتکردنی یەزیدیش بڵاو نەبۆوە،[3] بەڵام سەبارەت بەو بەناوحەدیسەی کە بە مەرفوعی هاتووەو دەڵێ: ((لایزال أمر أمتي قائماً، حتى يثلمه رجل من بني أمية يقال له يزيد)) واتە: بەردەوام کاروباری ئۆممەتم بەرقەرار دەبێ هەتا ئەو کاتە پیاوێك لە بەنی ئومەییە کە پێی دەوترێ (یەزید) کەلێنی تێدەخاتو دەیڕوخێنێ. بێگومان ئەم حەدیسە بە حوکمی ئەوە زیاتر لە عیللەتێکی تێدایە حەدیسێکی ناڕاستە،[4] (أبو يعلى) لە موسنەدەکەی خۆیداو لە

---

١ مسند أحمد (٤/٣٦٧).

٢ الفتاوى (٤/٢٩٧، ٢٩٨).

٣ مواقف المعارضة (ص: ٥٠١).

٤ أحداث وأحاديث فتنة الهرج (ص: ٢٠٤)، مسند أبو يعلى (رقم: ٨٧٠).

ڕێگای (صدقة السمین) لە (هشام) لە (مکحول) لە (أبي عبیدة)وە بە مەرفوعی هێناویەتیو، دوو عیللەتی تێدان:

أ- لاوازی (صدقة السمین) أبو معاویە: صدقەی کوڕی عبدالسمینی دیمەشقی، (إبن معین‌و بوخاریو أبو زرعەو نسّائی) بە زەعیفو لاوازیان داناوە، (أحمد) دەڵێ: هەر حەدیسێکی بە مەرفوعی هێنابێ (مونکەر)و نامۆیە، هەر حەدیسێکی بە مورسەلی هێنابێ ئەوا لە نامۆ سوکترەو بە زۆر لاواز لە قەڵەم دەدرێ، هەروەها (هەر أحمد) دەڵێ: بە هیچ ناچێ، حەدیسەکانی مونکەرونامۆن. (الدار القطني) دەڵێ: (مەتروك) واتە فەرامۆش کراوە.[1]

ب- لێرەدا پچڕانێکی گەورە لە نێوان (مکحول)و (أبو عبیدە)دا هەیەو یەکتریان نەدیوە.[2]

(إبن کثیر) قسەی لەسەر ئەو حەدیسانە کردووە کە دەربارەی زەمبی یەزید هاتوون‌و دەڵێ: (إبن عساکر) حەدیسی زۆری لەسەر زەمبی یەزیدی کوڕی معاویە هێناون‌و هەر هەموویان هەڵبەستراوو (موضوع)ن‌و، فریان بەسەر ڕاستیەوە نیە، ئەوقسانەی ئێمە لەسەرمان کردوون باشترین شتە لەسەر لاوازی زنجیرەی سەنەدەکانیان‌و لێکپچڕانی هەندێکیان، خودا چاکتر دەزانێ.[3]

## سێزدەیەم: وریابوون لەو چیرۆکە ئەفسانەییانەی سەبارەت بە کوژرانی حوسێن دانراون:

شیعە لە میانەی گواستنەوەی هەواڵەکانی ئەو کارەساتەدا زیادەڕۆییەکی بێ ئەندازیان کردووەو، کتێبەکانی مێژوویان بە هەواڵگەلی سەرسوڕهێنەر ئاخنیوە، وتراوە: دوابەدوای کوژرانی حوسێن ئاسۆکان سوور هەڵگەڕان‌و خوێن لە ژێر بەردەکان هەڵقوڵیوەو جنۆکە دەستیان بە گریان‌و شین‌و شەپۆڕ کردووەو دەیان حیکایەتی تری لەم شێوەیە کە بە ئەقڵی شیعەکانی ئەو دەمە هەڵبەستراون‌و، هەتا ئیمڕۆشی لەگەڵدا بێو بە خاتری گەورەکردنی ئەم ڕووداوە لەسەر حیسابی تەواوی ڕووداوەکانی تر ئەم چیرۆکە ئەفسانانە دەخوێننەوەو دەڵێنەوە.[4] هەر کەسێك لە سەنەدی ئەو ڕوایەتانە بکۆڵێتەوە جگە لە هەبوونی لاوازیەکی

---

١ تهذیب التهذیب (٣٨١/٤).

٢ أحداث وأحادیث (ص: ٢٠٤).

٣ البدایة والنهایة، نقلا عن أحداث وأحادیث (ص: ٢٠٤).

٤ أحداث وأحادیث فتنة الهرج (ص: ٢٠٤).

مردەڵەو بێ گیان هیچی تریان پێوە نابینێو، ناوی كەسانێك دەبینێ كە نامۆو نەناسراوو بێ ئەسڵو نەسەبن، یان بە خاتری خۆڵكردنە چاوی خەڵك لە بەرانبەر بینینی ڕاستیەكاندا تەدلیسیان لە زنجیرەی سەنەدەكان كردووەو بە حیسابی خۆیان ناوی ڕاویەكیان هێناوە كە لە سەردەمی ئەو كەسەدا ژیاوە كە بە حیساب حەدیسەكەی گێڕاوەتەوە بەڵام لە ڕاستیدا ئەم ڕاوی دووەمە چاوی بە ڕاوی یەكەم نەكەوتووە.[1]

یەكێك لە نموونەی ئەو درۆو دەلەسانەی كە لە لایەن مێژوونووسەكانی شیعەوە وتراوەو نووسراوە: لەم ڕووداوەدا ژنو كچە بە كۆیلەكراوەكان بە ڕووتو قووتی سواری جوانو وشتری بێ زین كران، كار بەوە گەیشت هەر لەو ڕۆژەوە وشترە بوختیە خۆراسانیەكان بە خاتری داپۆشرانی دامێنی پاشو پێشەوەی كۆیلەكان خێرا كۆپانی پشتەوە یان بە كۆڵكەوە لێ ڕوێنرا.[2] إبن كثیر دەڵێ: شیعەكان زیادەڕۆیی زۆریان دەربارەی ڕۆژی عاشورا كردووەو حەدیسگەلێكی زۆرو حیكایەتی درۆو بێ ماناو قێزەونیان هەڵبەستوون، ئەوان وتوویانە: لەو ڕۆژەدا خۆرگیراو كار بەوە گەیشت ئەستێرە هەڵاتن، هەر بەردێكت هەڵدابایەوە خوێنت لە ژێریدا دەبینی، تاشقی ئاسمان سوور هەڵگەڕا، كە خۆر هەڵدەهات تیشكەكانی وەكو خوێن سوور دەبوونو ئاسمان ڕەنگی خوێناوی بوو، ئەستێرەكان لە یەكتریان دەدا، ئاسمان خوێنێكی سووری باراند، تا ئەو ڕۆژە ئاسمان خۆی بە سوور نەنواندبوو، كاتێك سەری حوسێنیان بردە نێو كۆشكی ئیمارەوە دیوارەكانی كۆشك خوێنیان لێ دەتكا، سەر زەوی بۆ ماوەی سێ ڕۆژ تاریك هەڵگەڕا، هەر گوڵە زەعفەرانو وەرسێك دەستی لێ درابایە، چونكە لەتاوان گریان گرتبوو دەسوتاند، هەر بەردێك لە بەردەكانی (بیت المقدس) هەڵدرابایەوە خوێنێكی تازەی خەستت لە ژێردا دەبینی، ئەو وشترانەی بە تالانی لە حوسێنیان گرتبوونو كوشتبوویاننەوەو كوڵاندبوویانن، گۆشتەكەیان لە كاتی خواردندا وەك قوزەڵقورتیان لێ هاتبوو تاڵ ببوو، ئەمەو دەیانی تر لەم درۆو دەلەسەو حیكایەتە هەڵبەستراوانە كە فریان بەسەر ڕاستیەوە نیە.[3]

---

١ أحداث وأحاديث فتنة الهرج (ص: ٢١٣).

٢ البداية والنهاية (١١/٥٦٣، ٥٦٥).

٣ البداية والنهاية (١١/٥٧٦).

**تۆڵەسەندنی خودا لە بکوژانی حوسێن:**

بەڵام سەبارەت بەو ڕیوایەتانەی باس لەو بەڵاو نەهامەتیانە دەکەن کە تووشی بکوژانی(حوسێن وهاوەڵانی) بووە زۆربەیان ڕاستو دروستن، کەم هەبوو لەوانە لە دونیادا تووشی نەخۆشیەکی کوشندە نەبێت، زۆربەشیان ئاقڵیان تێکچوو وشێت بوون، هەرچی شیعەو ڕافیزەکانن سەبارەت بە وێناکردنی کارەساتی کوژرانی حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) درۆو دەلەسەی زۆرو حیکایەتی دوورو درێژیان هەن، هەندێك لەو شتانەی ئەوان کە باسمان کردن لێوەکردن بەسن، تێبینیشمان لەسەر هەندێك لەو ڕیوایەتانە هەیە، خۆ ئەگەر (إبن جرير)و هەندێك لە حافیزانی زانست لە کتێبەکانی خۆیاندا نەیاننووسیبانایەوە هەرگیز باسم نەدەکردن، زۆربەی ڕیوایەتەکانیان لە ڕێگای (أبي مخنف لوطی کوڕی یەحیا)وە گێڕاونەوە، کە بابایەکی شیعە مەزەب بووەو بە لای ئیمامانی حەدیسەوە حەدیسەکانی بە زەعیفو لاواز دادەنرێن، بەڵام هەرچی (إبن جرير)ە ئەو ڕیوایەتو حیکایەتانەی لە لای ئەوی دەستکەوتوون لە لای کەسی تری دەست نەکەوتوون، هەر لەبەر ئەمەشە زۆربەی دانەرانی دوای ئەو لەسەر چەسپاندنی ڕیوایەتەکانی (أبی مخنف) پاڵپەستۆی یەکتریان داوەو ویستوویانە پێش یەکتر بدەنەوە، والله أعلم.[1]

(إبن تيمية) (بەر ڕەحمەتی خوا بکەوێ) دەڵێ: بەڵام پرسیار کردن سەبارەت بە ئەوە: کە ئالوبەیت بە کۆیلە کرابنو بەڕووتو قووتی سواری وشتری بوختی (خۆراسانی) کرابنو بە خاتری داپۆشرانی عەورەتی ئەوان لەو ڕۆژەوە کۆپانیان لەسەر پشت لێ ڕوابێ، ئەمە قێزەونترین درۆیە، لە ڕیزی ئەو بوختانانەیە کە لە لایەن مونافیقو زندیقەکانەوەو بە ئامانجی تانەو تەشەردان لە ئیسلامو ئەهلی ئیسلامو ئالوبەیت هەڵبەستراون، ئەگەر بێتو یەکێك گوێبیستی ئەمە بێتو بە درۆو دەلەسەکانی ناوەوەی ئاشنا بێت، گومان دەبات، یان دەڵێ: هەموو ئەو شتانەی بە ئێمە گەیشتوون لە موعجیزاتی پێغەمبەرانو کە ڕاماتی ئەولیا لەم ڕەگەزەن، ئەمجا ئەگەر ڕوون بۆوە کە ئوممەتی ئیسلام ئالوبەیتی پێغەمبەرەکەی خۆی کردۆتە کۆیلەو کەنیزەك، ئەوا ئەو دەمە هەر خودا بۆ خۆی دەزانێ کە چ تانەو تاشەرێکی گەورە لە باشترین ئوممەت دەدرێ کە بۆ خەڵك دەرچووە، ئاخر هەموو مرۆڤێکی ژیر دەزانێ کە وشتری بوخاتی وەکو غەیری خۆی لە وشترو مەڕو مانگاو ئەسپو ئێستر بەر لە

---

[1] البداية والنهاية (١١/٥٧٧).

ڕەوانەکرانی پێغەبەر (ﷺ) لە لایەن خوداوەو بەر لە پەیدابوونی ئالوبەیت دروست کراوەو بوونی هەبووە[1] لەو ڕۆژەشەوە کە خودا دروستی کردووە ئەو کۆپانەشی بۆ دروست کردووە کە وەکو زین یان کورتانێکی بچووك لە سەر پشتی بەرز بۆتەوە[2]. زۆر بە داخەوە سەرچاوەکانی مێژووی ئیسلام، وەك مێژووی (الطبري)و مێژووی (إبن عساكر)و هی تریش بە وێنەی ئەم درۆو دەلەسە پوچو بێ بنەمایانە ئاخنراون، ئەمە وادەکات لێکۆڵینەوەیەکی زانستیانە بۆ کتێبەکانی مێژوو بە شێوەیەکی گشتیو بۆ ئەم دوو کتێبە بە شێوەیەکی تایبەت دەست پێ بکرێ.[3]

## چواردەهەم: لەو شیعرانەی بۆ شینی حوسێن (خوا لێی ڕازی بێت) وتراون:

سلیمان کوڕی قتە التیمی دەڵێت:

وإن قتيــل الطّــف من آل هاشم — أذل رقــابــاً مـن قريش فذلّت
مــررت عــلى أبيـــات آل محمد — فألفيتها أمثـالهـا حــين حُلّت
وكانوا لنـــا غُنْمــاً فعـــادوا رزيّة — لقـــد عظمـت تلك الرازيا وجلّت
فـــلا يبعـــد الله الديـــار وأهلهـــا — وإن أصبحت منهم برغمي تخلت
إذا افتقرت قيسٌ جبرنـــا فقـــيرَها — وتقتلنـــا قيـــس إذا النّعلُ زلّت
وعند غِنيٍّ قطرة مـــن دمـــاءنـــا — سنجزيهـم يوماً بها حيـث حلّت
ألم تر أن الأرض أضحت مريضـــة — لفقد حســـين والبـلاد أقشعرت[4]

(أبو الأسود الدؤلي)یش دەربارەی کوژرانی حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) وتوویەتی:

أقـــول وذاك مـــن جـــزع ووجـــد — أزال الله مـــلـــك بنـــي زيـــاد
وأبعدهم بمـــا غـــدروا وخـــانوا — كمـــا بعدت ثمود وقـــوم عـــاد
هموا خَشَمُـــوا الأنوف وكنـــا شُمّا — لقتل ابن القُعَاسِ أخـــي مـــراد[5]
قتيـــل الســـوق يـــا لك مـــن قتيل — بـــه نضـــح من أحمر كالجِساد

---

١ الفتاوى (٣٠٦/٤).

٢ الفتاوى (٤٨١/٢٧).

٣ أحداث وأحاديث فتنة الهرج (ص: ٢١٣).

٤ الطبقات تحقيق السلمي (٥١٢/١).

٥ (إبن القعاس) وەسفە بۆ هانیئی کوڕی عوروە، دەوترێ پیاوێکی (أقعس)ە، واتە پێ چەسپاوو دامەزراوو بە دەسەڵاتە، لسان العرب (١٧٧/٦).

وأهل نبينـــا من قبـــل كـــانوا ذوي كــــــرم دعــائم للبلاد
حسين ذو الفضول وذو المعـالي يزين الحـــاضــرين وكلٍّ باد
أصـــاب العزَّ مَهْلكُـــهُ فـــأضحى عميـــداً بعد مصرعه فؤادي[1]

(عبدالله ی كوڕی حوڕ)يش وتوويەتی:

يـــا لك حسرة مـــا دمت حيـــا تردّد بين حـلقـي والتّراقي
حسيناً حين يطلب بذل نصـري على أهل العـداوة والشّقاق
ولـــو أنـــي أواسيـــه بنفســـي لنلت كرامـــة يـوم التّلاق
مع ابن المصطفى نفسـي فـداه فولّى ثـــم ودّعَ بـــالفراق
غداة يقـــول لي بالقصــر[2] قولا أتتركنـــا وتُزمع بـــالطلاق؟
فلـــو فلـــق التّلهّفُ قلـــب حَيّ لهـــمَّ اليومَ قلبي بـــانطلاق
فقد فاز الأُولى نصـــروا حسينـاً وخاب الآخرون أولو النفاق[3]

(محمد إقبال)يش دەڵێت:

وحســـــين في الأبرار والأحـــرار ما أزكى شمائله وما أنداها
فتعلمـوا ريّ اليقين من الحسين إذا الحسين وقد أجاب نداها
الأمهـــات يلدن للشمس الضياء وللجواهر حسنهـــا وصفاها [4]

---

١ الطبقات تحقيق السلمي (١/٥١٢).
٢ مەبەستی پێ لەو كۆشكەيە كە لەوێدا لەگەڵ حوسێن پێكگەيشتوون.
٣ الطبقات (١/٥١٦).
٤ الدوحة النبوية (ص: ١٣٠).

# باسی سێیەم
# گرنگترین پەندو وانە
## یەکەم: ڕۆژی عاشوڕا

(ڕۆژی عاشوڕا): بریتیە لە ڕۆژی دەی مانگی محرم، بیدعەگەلێکی خراپی تێدا پەیدا کراون، دەربارەی ئەو ڕۆژە دوو تاقم یەکیان بە زیادەڕەوی کردن تێیداو ئەوی تریان بە کەمتەرخەمی کردن تێیدا لە ڕووی ئیمانەوە لە بەین چوون، یەکێکیان کردوویەتی بە ڕۆژی شادیو خۆشی، ئەوی تریشیان کردوویەتی بە ڕۆژی ماتەمینیو شینو شەپۆڕ و لە خۆدان.[1] شیعە سەبارەت بە کوژرانی حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) زیادەڕەویەکی بێ ئەندازەیان کردووەو، ڕۆژی تێداشەهیدبوونی ئەویان کە دەکاتە ١٠ محرم کردووە بە ڕۆژی ماتەمو دڵتەنگیو شینگێڕانو دادو فوغانو لەخۆدان، هەموو ساڵێك هەتا ئەمڕۆش یادی دەکەنەوەو بەردەوام شینی تێدا دەگێڕنو، لە بەرانبەر ئەنجامدانیدا پاداشتیان بۆ حیساب کردووە، پێیان وایە دەبێتە مایەی لێخۆشبوونو ڕەحمەتو سڕینەوەی گوناهو تاوانەکانیان.[2] (الطوسي) لە کتێبی (أمالي)یدا بە سەنەدی خۆی لە (علي الرضا) (سەلامی خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: هەر کەسێك لە ڕۆژی عاشوڕادا واز لە جێبەجێکردنی پێداویستیە تایبەتیەکانی خۆی بێنێت، خودا پێداویستیەکانی دونیاو دواڕۆژی بۆ جێبەجێ دەکات، هەر کەسێك ڕۆژی عاشوڕا بکات بە ڕۆژی تازیەو خەمو پەژارەو گریانو ماتەمین، خودای بەرزو مەزن ڕۆژی قیامەتی بۆ دەکات بە ڕۆژی شادومانیو دڵخۆشیو لەنێو باخەکانی بەهەشتدا چاوی بە بینینی ئێمە(ی ئەهلی بەیت) ئارام دەبێ.[3] هەر (الطوسي) بە سەنەدی خۆی لە أبی عمارەی کوفیەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: گوێم لە جعفری کوڕی محمد (علیه السلام) بوو دەیوت: هەر کەسێك بێتو بۆ خاتری خوێنێکی ئێمە کە ڕژێنراوە ومافێکمان کە زەوت کراوەو ناموسێکمان کە زەبری لێ دراوە، یان بۆ هەر یەکێك لە شیعەی ئێمە بەچاوی فرمێسك بڕێژێت خودای بەرز لە بەرانبەر ئەم کارەیدا جێگای هەزاران ساڵ ژیانی لە بەهەشتدا بۆ خۆش دەکات.[4] (البرقي) بە سەنەدی خۆی لە (جعفر الصادق)ەوە

---

١ الأعياد وأثرها على المسلمين، سليمان السجمي (ص: ٢٦١).

٢ العقيدة في أهل البيت بين الإفراط والتفريط (ص: ٤٩٠).

٣ أمالي الطوسي (ص: ١٩٤)، بحار الأنوار (٢٨٤/٤٤).

٤ البحار (٢٧٩/٤٤)، أمالي المفيد (ص: ١٢).

دەگێڕێتەوە، کە وتوویەتی: هەر کەسێك ناوی حوسێنی لە لا بهێنرێتو فرمێسکێکی بە قەد باڵە مێشولەیەك لەچاو بتکێ خودا لە هەموو گوناهەکانی خۆش دەبێ ئەگەر بە قەد کەفی دەریاش زۆر بن.[١] (المجلسي) لە کتێبی (البحار)دا (باب)ێکی سەربەخۆی بە ناوی (بابی پاداشتی گریان بۆ کارەساتی حوسێنو تەواوی ئیمامەکان) داناوەو باسی (ئادابی شینگێڕان لە ڕۆژی عاشوڕادا)شی تێدا کردووەو تێیدا زیاتر لە (٣٨) سیو هەشت[٢] ڕیوایەتی هێناوە، بۆ نموونە بە سەنەدی خۆی لە أبی عبیدالله (علیه السلام)ەوە، دەگێڕێتەوە، کە وتوویەتی: هەموو هاتوهاوارو گریانێك مەکرووهە جگە لەو هاتوهاوارو گریانەی بۆ حوسێن (علیه السلام) ئەنجام دەدرێت.[٣] بەڵکو پێیان وایە کە ئاسمانو زەوی بۆ کوژرانی حوسێن گریاونو، ئاسمان خوێنی باراندووەو زەویش گڵی سووری لێ هەڵقوڵاوەو، هەروەك چۆن فریشتەو جنۆکەو تەواوی دروستکراوانی خودا بۆی گریاون.[٤] هەر بەمە وازیان نەهێناوە، بەڵکو بە ڕۆژووبوونیان لە ڕۆژی عاشوڕادا حەرام کردووەو وتوویانە: هەر کەس تێیدا بەڕۆژو بێ ئەوە دوژمنی حوسێنو تێکڕای خانەوادەکەیەتی،[٥] (الكليني) بە سەنەدی خۆی لە (جعفری کوڕی عیسا)وە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: دەربارەی ڕۆژوی عاشوڕاو ڕای خەڵك دەربارەی ئەو ڕۆژە پرسیارم لە رضا (علیه السلام) کرد، وتی: سەبارەت بە ڕۆژووی ئیبنو مەرجانە (ئیبنو زیاد) پرسیارم لێ دەکەی؟ ئەوە ئەو ڕۆژەیە کە جارچیانی کوشتنی حوسێن (علیه السلام) لە (ئالوزیاد) تێیدا بەڕۆژو بوون، ئەوە ڕۆژێکە ئالوبەیتی محمد (ﷺ)و ئەهلی ئیسلام بە شومو نەخسی دادەنێنو، نە ڕۆژوی تێدا دەگیرێتو نە بە پیرۆزیش دادەنرێت، ڕۆژی دوو شەممەش ڕۆژێکی نەخسو شومە، خودای گەورەو بە دەسەڵات گیانی پێغەمبەرەکەی تێدا کێشاوە، ئالوبەیتی محمدیش تەنها لە ڕۆژی دوو شەممەدا تووشی کارەساتو نەهامەتی بوون، بۆیە ئێمە بە شومی دادەنێین، ئیبنو مەرجانە بە ڕۆژی فەڕو پیرۆزی داناوەو ئالوبەیتی محمدیش بە شومو نەخسیان داناوە، جا هەر کەسێك لەو دوو ڕۆژانەدا (واتە عاشوڕاو دوو شەممە)دا بە ڕۆژو بێو بە لایەوە موبارەك بن بە دڵی کوێرو مۆرکراوەوە

---

١ المحاسن (ص: ٣٦)، البحار (٤٤/٢٨٩).
٢ البحار (٤٤/٢٧٨، ٢٩٦).
٣ البحار (٤٤/٢٨٠).
٤ البحار (٤٤/٢٨٥، ٢٨٦).
٥ العقيدة في أهل البيت (ص: ٤٩٢).

دەگاتەوە بە خواو، لەگەڵ ئەو کەسانە حەشر دەکرێت کە پیشەی بەرۆژو بوونیان لەو دوو ڕۆژەدا داهێناوەو بە پیرۆزیان داناون.[1]

لەم بابەدا درۆی زۆرو زەوەند هەن، هەر دەمایەك شیعە هێزو دەسەلاتی پەیدا کردبێت، یان دەوڵەتێکی بۆ دروست بووبێت ئەم گریانو شیوەنانە بە ئاشکرایی دەرکەوتوون، کاتێك دەوڵەتی (بوەیهی)ی شیعی لە ساڵی ٣٥٢ك دامەزرا إبن بابەوەی (معز الدولة) خەڵکی بەغدای وادار کرد شین بۆ حوسێن بگێڕن، لەو ڕۆژەدا فەرمانی کرد دەرگای دوکانو بەرو بازاڕەکان دابخرێنو نەیهێشت چێشتخانەکان بکرێنەوە، ئیدی ژنانی شیعە بەسەرو پرچی کراوەوەو دەمو چاوی درەوشاوەوە هاتنە نێو قەدی بازاڕو دەستیان بە لەخۆدانو شیوەن کردو خەڵکیان تووشی داوی خۆیان دەکرد، ئەمە یەکەمین جار بوو بەم جۆرە شیوەن بۆ حوسێن بکرێت.[2] هەروەها دەوڵەتی (فاطمي عەبیدی)یش لەگەڵ ئەوەدا بۆنەو جەژنی زۆری هەبوون، بە ڕەسمی ڕۆژی عاشورای کردبوو بە ڕۆژی خەمو شیوەنو کارو کاسبی نێو بازاڕەکان ڕادەوەستێنراو، شێعرخوێنو شینگێڕەکان بەنێو کۆڵانو ڕێگاو بانەکاندا بڵاودەبوونەوە، لەو ڕۆژەدا خەلیفە دەمامکی دەکردو مات ومەلوول دادەنیشتو بە هەمان شێوە قازیو مەلاو فەرماندەو ناودارەکانیان وەکو خەلیفە دەمامکیان دەکردو بە پێخواسی دەهاتنە دەر، ئیتر شێعرخوێنو شینگێڕەکان دەستیان بە لاواندنەوەی ئالوبەیت دەکردو هەموو ئەو بەسەرهاتو چیرۆکانەیان دەخوێندنەوە کە سەبارەت بە چۆنیەتی کوژرانی حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) هەڵیان بەستبوون.[3] هەروەها لەو ڕۆژانەدا کەژاوەی تازیەبارییان دروست دەکردنو بەنێو بازاڕو ڕێگاوبانی شارەکاندا دەیانگێڕانو بە دەست لە کوڵمەو سینگی خۆیان دەداو، زنجیری ئاسنیان هەڵدەگرتو بە هەموو هێزی خۆیان لە شانو شەپیلکی خۆیان ڕادەکێشاو هەتا خوێنیان پێدا هاتبایە خوارەوە پێیان خۆش بوو.[4]

(إبن کثیر) سەبارەت بەو ڕەفتارە ناشەرعیانەی شیعە کە لە سەردەمی بوەیهیەکانو لە نزیکەی سەدەی چوارەمی کۆچیدا دەیانکردن دەڵێ: ئەو ڕۆژگارە لە ڕۆژی عاشوراو لە بەغداو شوێنەکانی تری ژێردەسەلاتیاندا تەپڵ دەکوتراو خۆڵەمێشو کاو وکۆتیان بەنێو ڕێگەو بانو بەرو بازاڕاندا وەردەکردو، پەڕۆی ڕەشیان بەسەر دیواری دوکانەکاندا

---

١ الکافي للکلیني (١٤٦/٤)، الاستبصار (٣٥/٢)، البحار (٥٩/٤٥).
٢ العبر للذهبي (٨٩/٢)، البدایة والنهایة (٥٧٧/١١).
٣ الخطط للمقریزي (٤٣١/١).
٤ العقیدة في أهل البیت (ص: ٤٩٤).

هەڵدەواسیو، خەڵك بە گریانو شینو شەپۆڕو دڵی تەنگەوە خۆیان دەردەخستو زۆربەیان لەپێناو ئەوەدا لە تێنوێتیدا لەگەڵ حوسێندا بێتەوە بەو ڕۆژە درێژە ئاویان نەدەخواردەوە، چونکە حوسێن بە تێنوێتی کوژرابوو، ئەمجا ژنان دەموچاوی خۆیان دەردەخستنو بە پێخواسی بەنێو بازاڕدا دەڕۆیشتنو -دێوانە ئاسا- سەریان دەلەقاندو لە دەمو چاوو سینگی خۆیان دەدا، وێڕای ئەمەش چەندین بیدعەی تری قێزەوەنو کاری نالەباری تریان ئەنجام دەدان، بەم هەموو ڕەفتارە دزێوانەو هاوشێوەیان مەبەستیان بوو ڕووی دەوڵەتی ئومەوی ناشیرین بکەن، چونکە لە ڕۆژگاری ئەواندا کوژرابوو.[1]

زانایانی شیعە ڕیکخستنی کەژاوەی تازیەبارییان بە دروست داناوەو، (محمد حسین الغروي النائیني) لە وەڵامی پرسیارێکدا کە سەبارەت بەم بابەتە ئاراستەی کرا، وتی:

١ـ هیچ گومان لەوەدا نیە کە ڕێپێوانو دەرچوونی کەژاوەی تازیەباری لەو دە ڕۆژەی (محرم)و عاشوراو ڕۆژانی هاوشێوەی ئەم ڕۆژانەدا بە نێو ڕێگەوجادەکاندا، جائیزو ڕێگەپێدراوەو، ئەنجامدانی بە پەسند دانراوە، چونکە زەقترین نیشانەی ڕاستو دروستە لەسەر تازیەی بابای ستەملێکراوو ئاسانترین هۆکاریشە بۆ گەیاندنی بانگەوازی حوسەینی بە خەڵکانی دوورو نزیك.

٢ـ هیچ گرفتێك لەسەر دروستبوونی سینگکوتانو بە دەمو چاو کێشان نیە بە دەست هەتا سنوری سووربوونەوەو ڕەشو شینهەڵگەڕانیان، بەڵکو بابەتی جائیزبوونی زنجیر لەخۆڕاکێشان بە تایبەت لە شانو پشت هەتا هەمان سنوور بەهێزتر دەبێت، هەروەها کاتێك کەسێك بە هۆی سینگکوتانو لە دەمو چاودانو زنجیر لەپشتڕاکێشان ئازارێکی پێ گەیشتو ئازاری لێ پەیدا بوو کەمێك خوێنی لێهات جائیز بوونەکە بەهێزتر دەبێ، دەرپەڕینی خوێنیش لە جەستە بە هۆی شمشێرو قەمەو زەرگ لە هەموو شتەکانی تر جائیزترە مادام زیانەکەی سەر بۆ مەترسی ناکێشێت.

٣ـ زاهیر وایە هیچ کێشەو گرفتێك لەسەر بەدروستو ڕەوا دانانی ئەو تەمسیلیو نواندنو خۆشوبهاندنانە نیە کە شیعەی ئیمامی بۆ ماوەی چەند سەدەیەکە بە مەبەستی بەرپاکردنی تازیەخوانو گریانو گریاندن عادەتی پێوە گرتووە، ئەگەر ئەم نواندنانە ئەوەشیان تێدا بێ کە پیاوان بەرگو پۆشاکی ژنان لەبەر بکەن بە ڕای هەرە بەهێز دروستە، ئەم فتوایە هەتا

---

[1] البدایة والنهایة (١١/٥٧٧).

ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێ شیعە کاری پێ دەکات‌و، کۆڕاو ئیجماعیان لەسەر بەستووەو، زیاتر لە ١٢ ئاخوند ئەمەیان براندۆتەوەو تێپەڕاندووە.[١]

(ناصر الدین شاه) لە وەسفی ئەم دیاردانەدا دەڵێ:

ئەم بۆنە ماتەمینیانە لە هیندو پاکستان‌و ئێران‌و عێراقدا بە ڕەنگی جۆراوجۆر خۆیان پێشان دەدەن، بەم جۆرە خەڵك دەچێتە نێو جادەو شەقامەکانەوەو، بە ڕووتی بە دوای کەژاوەیەك دەکەون کە بە بەرزایی چەند مەترێك دروستیان کردووەو، جۆرە زنجیرێکی ئاسن هەڵدەگرن کە شفرەی تیژی بچوکیان بەسەرەکانیانەوە دروست کراوە، ئیتر بەم زنجیرە لە سنگ‌و پشت‌و شانی خۆیان دەدەن هەتا خوێنیان لێ دەچۆڕێت، زۆرجار هەیە هەندێکیان لێ دەمرن، بەڵام ژنەکانیان لەماڵەکانیان دادەنیشن‌و شین‌و شەپۆڕ دەکەن‌و دەگرین‌و لە سەرو سینگ‌و ڕوومەتی خۆیان دەدەن، هەموو ئەمە بە حیسابی خۆیان بە خاتری ڕێزگرتن لە حوسێن کە بە ستەملێکراوی کوژراوە.[٢]

(سەید موحسینی ئەمینی حوسێنی عاملی) هۆکاری بەرپاکردنی ماتەمینەکان باس دەکات‌و دەڵێ: ئامانجیان لە بەرپاکردنی ئەم ماتەمینانە ئەوەیە تا بۆ کوژرانی حوسێن (علیه السلام) گریان‌و شیوەن بە دەنگەوە یان بەبێ دەنگ دروست ببێت‌و فرمێسك لە چاوان بڕژێت‌و کارێکی لەو جۆرە بکرێت ببێتە هۆی کوڵهەستان‌و گریان‌و دەرخستنی دروشمی پەرۆشی‌و دڵتەنگی‌و داخ‌و پەژارە، لەم ئاهەنگی شیوەنانەدا باس لە چۆنیەتی توشبوونی حوسێن بەو کاەساتە باس دەکرێت‌و، شێعرو پەخشان بۆ لاواندنەوەی هەڵدەبەسترێن‌و بەسەر جەماوەردا دەخوێنرێنەوەو بەمەش دەروونەکان دەخرۆشێن‌و دڵتەنگی‌و کوڵهەستان‌و گریان دروست دەبێ.[٣]

هەر بە ئەمە وازیان نەهێناوە، بەڵکو (خومەینی) دەڵێ: گریان‌و شیوەن بەسەر سەروەری شەهیدان (علیه السلام)و بەرپاکردنی کۆڕو ئاهەنگی ماتەمینی حوسێنی بۆ ماوەی چواردە سەدە ئیسلامی پاراستووە.[٤] ئاخر، کەی گریان بانگەواز بووەو، کەی شین‌و شەپۆڕ جیهاد بووە؟ ئەمە بیروباوەڕی شیعەی ئیمامییە لە بەرانبەر کوژرانی حوسێن لە ڕۆژی عاشوردا،

---

١ مقتل الحسين وفتاوى العلماء والأعلام في تشجيع الشعائر للشيخ مرتضى عياد، وممن قرضها وأقرها (ص: ١٢ـ٤٠). العقيدة في أهل البيت (ص: ٤٩٥).

٢ العقائد الشيعية (ص: ١٣٥).

٣ إقناع الائم على إقامة المآتم (ص: ٢).

٤ العقيدة أهل السنة والجماعة في أهل البيت (ص: ٤٩٦)، نقلا عن (كشف الأسرار).

جا ئایادەبێ ئەم کردارانە هیچ پەیوەندیەکیان بە ئیسلامەوە هەبێ؟... بێگومان حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) لەو کردارانەی باس کران بەرییەو، ئەو ئیسلامەی باپیری (ﷺ) گەیاندی ڕێگەیان پێ نادات‌و بە جائیزیان دانانێ، پێغەمبەر-ی باپیری حوسێن- (ﷺ) دەفەرمووێت: (( لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَطَمَ الخُدُودَ، وَشَقَّ الجُيُوبَ، وَدَعا بِدَعْوَى الجاهِلِيَّةِ ))[1] واتە: کەسێك لە کولمەی خۆی بدات‌و بەرۆکی بدڕێت‌و سینگی بکوتێ‌و بە شێوازی هاواری سەردەمی نەفامی هاوار بکات لە ئێمە، هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((إِنَّ النَّائِحَةَ إِذَا لَمْ تَتُبْ قَبْلَ مَوْتِهَا تُقَامُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَيْهَا سِرْبَالٌ مِنْ قَطِرَانٍ وَدِرْعٌ مِنْ جَرَبٍ))[2] واتە: ئەگەر شینگێڕ بەر لە مەرگی تۆبەی نەکرد، ڕۆژی قیامەت زیندوو دەکرێتەوەو جزداشەیەکی لە قوڕقوشم یان مسی تواوەو ژێرکراسێکی گونیە ئاسای ئاگرگری لەبەر دەکرێ، هەروەها (ابوموسی) گوتی: ((إِنَّ رسُولَ اللهِ (ﷺ)بَرِيءٌ مِنَ الصَّالِقَةِ ، والحَالِقَةِ ، والشَّاقَّةِ))[3] واتە: پێغەمبەر(ﷺ) بەرییە لە هات‌و هاوارکەرو قژڕنەرو بەرۆك دادڕ.

بێگومان ئەو کردارانەی شیعەکان لە حوسەینیەکان‌و ماتەمینەکانیاندا لە ژێر ناونیشانی ئەوەی بۆ خۆیان پێی دەڵێن (دروشم‌و حوسەینیەکان) ئەنجامیان دەدەن لە: لە خۆدان‌و هاتوهاوارو شینگێڕان‌و پۆشینی بەرگی ڕەش‌و چەندین کاری تری لەم چەشنە کە زانا مەزنەکانیان بە جائیزیان داناون‌و فتوایان بۆ داون ئەنجامیان بدەن، هەر هەموو ئەمانە لەسەر زمانی پێغەمبەری خودا (ﷺ)و لەسەر زمانی ئیمامانی ئالوبەیتی بەڕێزو لە سەرچاوە کۆن‌و نوێکانی شیعەشدا بە حەرام دانراون، زانا بەناوبانگەکانی مەزهەبی دوانزە ئیمام (إثنا عشر)ەی شیعە دانیان بەم حەرامبوونەدا هێناوە.[4] تەماشاکەن، ئەمە (محمدی کوڕی علی کوڕی حوسێنی بابەوەیهی قومی)یە کە لە لای شیعە بە (الصدوق) ناسراوە، دەڵێ: بەپێی وشەکانی پێغەمبەری خودا (ﷺ): ((النياحة من عمل الجاهلية))[5] واتە: شینگێڕان یەکێکە لە کارەکانی سەردەمی نەفامی. (محمد باقر المجلسي)یش بەم جۆرەی ڕیوایەت کردووە: ((النياحة من عمل الجاهلية))[6] واتە: شینگێڕان کرداری سەردەمی

---

١ البخاري (رقم: ١٢٩٤).
٢ مسلم (رقم: ٩٣٤).
٣ مسلم (رقم: ١٦٧)، كتاب الايمان.
٤ من قتل الحسين (ص: ٣٧).
٥ من لا يحضره الفقيه (٤/٢٧١، ٢٧٢).
٦ بحار الأنوار (٨٢/١٠٣).

نەفامییە. کەواتە بە گوێرەی ئەو هەواڵانەی لە پێغەمبەر (ﷺ)ەوە پێمان گەیشتوون ئەو شین و شەپۆڕو ماتەمینەی شیعەکان نەوە لە دوای نەوە لەسەری ڕۆیشتوون و دەڕۆن یەکێکە لە کردارەکانی سەردەمی نەفامی[1] –واتە سەردەمی پێش هاتنی ئیسلام–، یەکێکی تر لەو ڕیوایەتانەی کە ڕێگری لە ئەنجامدانی ئەم کردارانە دەکات کە شیعەکان دەیکەن بریتیە لەم وتەیەی (عەلی)ی ئەمیری ئیمانداران: ((وإياك والنواح على الميت ببلد يكون لك به سلطان))[2] واتە: ئەگەر لە وڵاتێکدا یان شارێکدا دەسەڵاتت هەبوو نەیەڵی شین لەسەر مردوو بکرێت. هەروەها هەر (عەلی) دەڵێ: ((ثلاث من أعمال الجاهلية، لايزال فيها الناس حتى تقوم الساعة: الاستسقاء بالنجوم، والطعن في الانساب، والنياحة على الموتى))[3] واتە: سێ سیفەت هەن کە خەڵك تا هەستانی قیامەت دەستبەرداریان نابن لە کردەوەی سەردەمی نەفامین، داواکردنی باران بە هۆی ئەستێرەکانەوە، تانەو تەشەردان لە ڕەچەڵەکی خەڵکانی تر، گێڕانی شین لەسەر مردوو.

بەڵگەیەکی تر لەسەر حەرامبوونی شین ئەم وتەیەی (ئیمام باقر)ە: ((أشد الجزع الصراخ بالويل والعويل ولطم الوجه والصدر وجز الشعر من النواصي، ومن أقام النواحة فقد ترك الصبر وأخذ في غير طريقة))[4] واتە: خراپترین هەڵپەهەڵپ بریتیە لە: قیژاندن بە واوەیلاو ڕۆڕۆ و ڕنینی دەم و چاوو ڕوومەت بە چڕنوك و سینگ کوتان و ڕنینەوەی قژی سەرو کاکۆڵی پێشەوەی سەر، هەر کەسێك ئاهەنگی شین ساز بکات ئەوە صەبرو دانبەخۆداگرتنی تەخر کردووەو، لە ڕێگای ئارامگرانی لاداوەو ڕێگایەکی تری گرتۆتەبەر. (شێخ حسن مغنية)ش ڕەخنە لەو ڕووداوو کارەساتانە دەگرێ کە لە ئەنجامی خەنجەرو شمشێر وەشاندن لەسەر ڕژانی خوێن دەکەونەوەو، دەڵێ: لە ڕاستیدا وەشاندنی خەنجەرو شمشێر لەسەرو ڕژاندنی خوێن فڕیان بەسەر ئیسلامەوە نیەو، هیچ دەقێکی ڕاشکاو لەسەر ئەم بابەتە نەهاتوە، بەڵام بریتیە لە سۆزێکی نازدارو دەروونی ئیمانداران لە بەرانبەر ڕژانی هەموو ئەو خوێنە خاوێنەدا

---

١ من قتل الحسين (ص: ٧٣).

٢ مستدرك الوسائل للنووي (١٤٤/١).

٣ بحار الأنوار (١٠١/٨٢).

٤ الكافي للكليني (٢٢٢/٣، ٢٢٣).

دەخرۆشێنێت کە لە قەسابخانەکەی کارەساتی کەربەلادا ڕژێنرا.[١] هیچ گومانی تێدا نیە کە ئەم کردارانە دەچنە ڕیزی شتە خراپ‌و قێزەون‌و بیدعە دزێوەکانەوە.[٢]

کوژرانی حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) موصیبەتێکی مەزنە، ئیسلامیش بەرنامەی بۆ داناوین کە چۆن لەگەڵ ئەم موصیبەتەو تەواوی موصیبەتەکانی تردا ڕەفتار بکەین، هەندێك لەو ئاداب‌و ڕەوشتانەی کە ئیسلام بۆ کاتی هاتنەدی موصیبەتەکان بۆی داناوین بریتین لە:

١ـ ئارامگرتن لەسەری:

گەورەترین ئادابی کاتی هاتنەپێشی یان ڕوودانی کارەسات بریتیە لە ئارامگرتن‌و، دەبێ مرۆڤی بە ئیمان لە بەرانبەر ئەو موصیبەتەی بەسەریدا دێت ڕەچاوی بکات، بەندکردنی دڵ لە بەرانبەر ناڕازی بووندا‌و، زمان لە بەرانبەر دەربڕینی سکاڵاداو تەواوی ئەندامەکان لە بەرانبەر ئەنجامدانی کردارگەلێك کە دەبنە مایەی تووڕەبوونی خودای بەرزو مەزن لە: لە دەم‌و چاودان‌و سینگکوتان‌و قژڕنینەوەو بانگلێدانی سەردەمی جاهیلی بەسەر مردوودا، دەبێ ئەم ئارامگرتنە هەر لە یەکەم کاتی بیستنی هەواڵی کارەساتەکەوە دەست پێ بکات، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((إِنَّمَا الصَّبْرُ عِنْدَ الصَّدْمَةِ الأُولَى))[٣] واتە: ئارامگرتن–ی جوان– تەنها لە کاتی ڕاچڵەکاندنی یەکەمدایە.

٢ـ حیسابکردنی پاداشت لە بەرانبەر خودی کارەساتەکەو ئارامگرتن لەسەری:

پێویستە مرۆڤی موسڵمان بە خاتری ئەوە کە خودا فەرمانی بە ئارامگرتن کردووەو بە خاتری جێبەجێکردنی فەرمانی خوداو بە دەسخستنی کرێ‌و پاداشتێك کە خودا بەڵێنی بە ئارامگران داوە بیانداتێ ئارام بگرێ، خودای بەرزو مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ﴾[٤] واتە: لە بەرانبەر هەر کارەساتێکدا کە دێتە ڕێت ئارام بگرە، ئا ئەمە یەکێکە لە کارە مەزنەکان. کاتێك خۆشەویستێکی لە دەست دەچێ ئەمە بە یاد خۆی بخاتەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێت: ((يَقُولُ اللهُ تَعَالَى مَا لِعَبْدِي الْمُؤْمِنِ عِنْدِي جَزَاءٌ إِذَا قَبَضْتُ صَفِيَّهُ مِنْ أَهْلِ الدُّنْيَا ثُمَّ احْتَسَبَهُ إِلاَّ الْجَنَّةَ))[٥] واتە: خودای

---

١ آداب المنابر (ص: ١٨٢).

٢ من قتل الحسين (ص: ٨٣).

٣ البخاري (رقم: ١٢٨٣).

٤ لقمان (١٧).

٥ البخاري (رقم: ٦٤٢٤).

بەرزو مەزن دەفەرموویت: هەر کات یەکێك لە خۆشەویستەکانی بەندەیەکی ئیمانداارم بۆ لای خۆم گێڕایەوەو گیانم کێشا، ئەمجا ئەو بەندەیەم-ئارامی گرتو- حیسابی ئەو موصیبەتەی خستە سەرمن، ئەوا منیش تەنهاوتەنها بە بەهەشت پاداشتی دەدەمەوە. وشەی (صَفِيَّهُ): بە واتای خۆشەویستەکەی دێ لە ڕۆڵەو باوكو دایكو تەواوی نزیکەکانی. بەم چەشنە خودای بەرزو مەزن بەڵێنی پاداشتی گەورەی داوە لە بەرانبەر ئارامگرتن لەسەر کارەساتەکان، بەڵام بەو مەرجە کە ئەو ئارامگریو دان بەخۆداگرتنە لەبەر خودا بێ، وەك خودای بەرزو مەزن دەفەرموویت: ﴿وَٱلَّذِينَ صَبَرُواْ ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِمْ﴾[1] واتە: ئا ئەوانەی لەبەر بەدەستخستنی ڕەزامەندی ڕووی پەروەردگاریان ئارامیان گرت، کەواتە پێویستە ئارامگرتن لەبەر خودا بێ، ئارامگرتنی داماوانە نا، بەڵکو ئارامگرتنێك کە بریتی بێ لە ڕازی بوونو خۆ تەسلیمکردن بە قەزاو بڕیاری خودا.[2]

٣ـ خوێندنی ویردی کارەسات لە کاتی ڕوودانیدا:

مرۆڤی موسڵمان لە کاتی ڕوودانی کارەساتدا دەڵێ: ((إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ ، اللَّهُمَّ أْجُرْنِي فِي مُصِيبَتِي وَأَخْلِفْ لِي خَيْرًا مِنْهَا)) واتە: ئێمە هەموومان هی خواینو بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە، دەسا خودایە لە بەرانبەر ئەم کارەساتەمدا پاداشتم بدەیتەوەو، بە چاکتر بۆم قەرەبوو بکەیتەوە.

خودای بەرزو مەزن دەفەرموویت: ﴿وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَٰتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُهْتَدُونَ ﴿١٥٧﴾﴾[3] واتە: مزگێنی بدە بە ئارامگران، ئەوانەی کاتێك کارەساتێکیان تووش دەبێو دەڵێن: ئێمە موڵکی خوداین، هەمووشمان بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە، ئا ئەوانە لە لایەن پەروەردگاریانەوە ڕەحمەتو سۆزو میهرەبانیان بەسەردا دەڕژێت، ئا ئەوانە هیدایەت دراون. پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرموویت: ((مَا مِنْ مُسْلِمٍ تُصِيبُهُ مُصِيبَةٌ فَيَقُولُ مَا أَمَرَهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ ، اللَّهُمَّ أْجُرْنِي فِي مُصِيبَتِي وَأَخْلِفْ لِي خَيْرًا مِنْهَا إِلاَّ أَخْلَفَ اللَّهُ

---

١ الرعد (٢٢).

٢ موسوعة الآداب الاسلامية، عبدالعزيز فتحي (٢/٧٨٦).

٣ البقرة (١٥٥_١٥٧).

عَزَّ وَجَلَّ لَهُ خَيْرًا مِنْهَا))[١] واتە: هەر موسڵمانێك كارەساتێكی بەسەر هات، ئەو زیكرە بخوێنێت كە خودا فەرمانی پێ كردووە لە كاتی كارەساتدا بیخوێنێت: (إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ -ئێمە موڵكی خوداین‌و بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە)و -دوعا بكات‌و بڵێ-: دەسا خودایە لە بەرانبەر ئەم كارەساتەمدا پاداشتم بدەوەو، لەجێی ئەو شتەی لە دەستم چوو شتێكی باشترم پێ بدەیتەوە، ئیللا خودا شتێكی باشتری پێ دەداتەوە لەوەی كە لە دەستی ڕۆیشتووە. (ئوم سەلەمە) وتی: كاتێك (أبو سلمه) مرد، وتم: دەبێ كێ لە (أبو سلمه) باشتر هەبێ؟! یەكەمین ماڵ بوو لە باشیدا -دیارە لە ڕوانگەی ئوموسەلەمە خۆیەوە- كە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) هیجرەتی كرد، ئەمجا زیكرو دوعاكەم كردن، خودا لە جێی (أبو سلمه) پێغەمبەری خودا (ﷺ)ی پێ بەخشیم.[٢]

هەروەها دەڵێ: (اللَّهُ اللَّهُ رَبِّي لا شَرِيكَ لَهُ)= خودا پەروەردگارمەو بێ شەریكە، چونكە ئەمە بە ئیزنی خودا دەبێتە مایەی ڕەوینەوەی بەڵاو كارەساتەكانی سەری، پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێت: ((مَنْ أَصَابَهُ هَمٌّ أَوْ غَمٌّ أَوْ سَقَمٌ أَوْ شِدَّةٌ ، فَقَالَ : اللَّهُ رَبِّي لا شَرِيكَ لَهُ ، كُشِفَ ذَلِكَ عَنْهُ))[٣] واتە: ئەگەر یەكێك خەمێك یان پەژارەیەك یان نەخۆشیەك یان كارەساتێكی توندی تووش بوو بڵێ: خودا پەروەردگارمەو هاوەڵی نیە، ئەوا ئەم نەهامەتیەی لەسەر دەڕەوێتەوە.

هەروەها نزای كارەسات دەخوێنێ، پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێت: ((دَعَوَاتُ الْمَكْرُوبِ : اللَّهُمَّ رَحْمَتَكَ أَرْجُو فَلا تَكِلْنِي إِلَى نَفْسِي طَرْفَةَ عَيْنٍ، وَأَصْلِحْ لِي شَأْنِي كُلَّهُ، لا إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ))[٤] واتە: نزاكانی كارەساتبار ئەمانەن: خودایە هیوام بە ڕەحمەتی تۆیە، بۆ ماوەی چاو تروكانێكیش عائید بە خۆم نەكەی، تێكڕای كاروبارم بۆ چاك بكە، جگە لە تۆ (یاألله) هیچ پەرستراوێكی بە هەق نیە.

هەروەها ئەویش وەكو پێغەمبەر (ﷺ) هەر كاتێك تووشی ناگوزوریەك ببێ بەم نزایەی پێغەمبەر (ﷺ) ڕوو لە خودا دەكات، ئەنەسی كوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: هەر كات كارێك پێغەمبەری خودا (ﷺ)ی سەغڵەت كردبایە، دەیفەرموو: ((یا حَيُّ یا قَيُّومُ،

---

١ مسلم (رقم: ٩١٨).

٢ مسلم (رقم: ٩١٨).

٣ صحيح الجامع (رقم: ٦٠٤٠).

٤ سنن أبي داود، رقم (٥٠٩٠)، صحيح الجامع رقم (٣٣٨٨).

بِرَحْمَتِكَ أَسْتَغِيثُ))[١] واتە: ئـەی خـودای هەمیـشە زینـدوو، ئـەی هەمیـشە ڕاوەسـتاوو ڕاگـری زەوی‌و ئاسمانەکان، پەنا بۆ ڕەحمەتت دەبەم.

**٤ـ خۆدوورگرتن لە هەر شتێك دەبێتە مایەی تووڕەبوونی خودا:**

لە بانگلێدان‌و هاتوهاوارو قسەی هەڵیت‌و پەڵیت‌و، دەم‌و چاو ڕوشـاندن‌و بـەرۆك دڕانـدن‌و سینگکوتان‌و قژ ڕنینەوەو، لاواندنەوەو شینگێڕان‌و، سکالآبردنە لای خـەڵك‌و، ئاراسـتەکردنی توك‌و دوعای ڕەش لەخۆ بە مەرگ‌و لەنێوچوون‌و هەلاهەلا بوون‌و شتگەلی تری لـەم بابەتانـە، بێگومان هەموو ئەمانە خودای بەرزو مەزن تووڕە دەکەن‌و بـە پێـچەوانەی ئـارامگرتن‌و ڕازی بوون بە قەزاو قەدەری خودا تەواو دەبن.[٢]

**٥ـ بچووككردنەوەی کارەساتەکە بە هۆی بیرکردنەوە لە کارەساتی مەرگی پێغەمبەری خودا (ﷺ):**

بێگومان مەرگی پێغەمبەر (ﷺ)و وەستانی وەحی ئاسمـان لـە هـەموو ئـەو کارەسـاتانە گـەورەتر بـوو کـە بەسـەر ئوممـەتی ئیـسلام‌و هـەموو موسـڵمانێکدا هـاتوون‌و دێـن، کاتێـك کارەساتبار ئەو کارەساتە مەزنەی وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) بـەبیر خـۆی دێنێتـەوە یەکسەر کارەسـاتەکەی خـۆی –هەرچـەندە گـەورەش بـێ– لەبـەر چـاو بـچووك دەبێتـەوە، چـونکە: کارەسـاتی گـەورە کاتێـك لـە بەرانبـەر کارەسـاتێکی گـەورەتردا ڕادەگیرێـت ئـەو ئـازارو مەینەتیەی لێی کەوتۆتەوە سووك دەبێ.

پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرموێت: ((إذا أصابَ أحَدَكُمْ مُصِيبَةٌ فَلْيَذْكُرْ مُصِيبَتَهُ بِي فإنَّها مِنْ أعْظَمِ المَصائِبِ))[٣] واتە: هەر کات یەکێکتان کارەساتێکی بەسەر هات، بـا کارەسـاتەکەی لە بەرانبەر کارەساتی –مەرگی– من ڕابگرێ، چونکە مەرگی من گەورەترین کارەساتە.

**٦ـ تەماشاکردنی ئەو نازو نیعمەتانەی لەنێو کارەساتەکەدان:**

یەکێك لەو ڕەوشتە جوانانەی کە موسڵمان دەبێ هەیبێ، بریتیە لەوە کاتێك کارەساتێکی بەسەر هات دەبێ تەماشای ئەو نازو نیعمەتانە بکات کە خودا بۆی لەنێو خودی کارەساتەکە هاویشتوون، یان بە هۆی ڕوودانی ئـەو کارەسـاتە پێـی دەبەخـشرێن، ئەگەرچـی کارەسـاتی کوژرانی حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) زۆر گەورەبێ و شەڕوئاشوبێکی بێ ڕەزای پێوە بـوو

---

١ سنن الترمذي (رقم: ٣٥٢٤)، صحيح الجامع.

٢ موسوعة الآداب الاسلامية (٧٨٨/٢).

٣ البيهقي شعب الإيمان (رقم: ١٠١٥٢)، صحيح الجامع (رقم: ٣٤٧).

بێ، بەڵام بە نیسبەت خودی (حوسێن)خۆیەوە خێرو چاکەو ڕێزلێنانە، (إبن تیمیة) (ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت) دەڵێ: کاتێك حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) کوژرا، ڕۆژی عاشوڕا بوو، تاقمێکی ستەمکاری یاخی کوشتیان، بەمە خودای تەعالا ڕێزی لێ گرت بە بەخشینی (شەهادەت) خەڵاتی کرد، هەروەك چۆن بەر لە ئەو ڕێزی لەو کەسانە گرت کە لە خانەوادەی ئەو بوون، ڕێزی لە (عەلی) باوکی‌و حەمزەو جەعفەرو غەیری ئەوانیش گرت‌و بەم شێوە خەڵاتی کردن‌و بە پلەی شەهادەتی گەیاندن ، شەهادەتەکەی یەکێکە لەو هۆکارە گەورانەی جێگەوپێگەو پلەو پایەی ئەوی لە بەهەشتدا پێ بەرز کردۆتەوە، چونکە گومانی تێدا نیە کە ئەوو حەسەنی کاکی سەییدی لاوانی بەهەشتن، شوێنە بەرزەکان‌و پلەوپایە مەزنەکان بە بەڵاو موصیبەت نەبێ دەست ناکەون، هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك پرسیاری لێ کرا، چ خەڵکانێك بە کارەساتی توند تاقی دەکرێنەوە؟ یان تووشی بەڵای بەهێز دەبن؟ فەرمووی: ((الْأَنْبِيَاءُ ثُمَّ الصَّالِحُونَ ثُمَّ الْأَمْثَلُ فَالْأَمْثَلُ مِنْ النَّاسِ يُبْتَلَى الرَّجُلُ عَلَى حَسَبِ دِينِهِ فَإِنْ كَانَ فِي دِينِهِ صَلَابَةٌ زِيدَ فِي بَلَائِهِ وَإِنْ كَانَ فِي دِينِهِ رِقَّةٌ خُفِّفَ عَنْهُ وَمَا يَزَالُ الْبَلَاءُ بِالْعَبْدِ حَتَّى يَمْشِيَ عَلَى ظَهْرِ الْأَرْضِ لَيْسَ عَلَيْهِ خَطِيئَةٌ))[١] واتە: پێغەمبەران، ئەمجا صاڵحان، ئەمجا کەسانی شکۆدار جا کەسانی پایەبەرز، هەر مرۆڤێك بە ئەندازەی بەهێزی‌و لاوازی دین‌و ئیمانەکەی بە کارەسات‌و نەهامەتی تاقی دەکرێتەوە، ئەگەر لە لایەنی دینەکەیەوە پتەوو دامەزراو بێ ئەو بەڵایەی پێی تاقی دەکرێتەوە زۆری لەسەر توند دەکرێت، بەڵام ئەگەر لەق‌و لاواز بێ ئەوا بەڵاکەی لەسەر سوك دەکرێت، ئیدی هەتا ئەو ڕۆژەی مرۆڤی ئیماندار بەسەر زەویدا بێت‌و بچێت بەڵاو موصیبەت لە کۆڵی نابنەوە، تا کار بەوە دەگات -ئەگەر کۆچی دوایی کرد- یەك گوناهو تاوانی لەسەر نامێنێت. حەسەن‌و حوسەین پێشوەخت لە لایەن خودای بەرزو مەزنەوە جێگەوپێگەو پلەوپایەیەکی بەرزیان بۆ بڕیار درابوو، بەڵام ئەو بەڵاو موصیبەت‌و کارەساتە توندانەی تووشی چینی پاکی پێش ئەوان ببوو، ئێقەی ئەمانی نەگرتبوو، هەردووکیان لە سەردەمی هێزو دەسەڵات‌و دەوڵەتی ئیسلامدا لە دایك بوون، لە ئامێزی هێزو ڕێزدا گەورە ببوون، موسڵمانان ئامۆژگارییان دەکردن‌و دڵسۆزییان بۆ دەنواندن‌و ڕێزیان لێ دەگرتن، پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی دوایی کرد هێشتا ئەوان خۆیان نەناسیبوو، تەمەنی تەمیزیان تەواو نەکردبوو، خودای بەخشندە بەو چەشنە ئاوری بەخێری لێ دانەوەو نازو نیعمەتی خۆی بەسەر دارشتن کە تووشی بەڵاو

---

١ الترمذي (رقم: ٢٣٩٨)، حسن صحيح.

موصیبەتێکی وایان بکات لە پلەو پایەو جێگەو پێگە-ی قیامەت-دا بیانگەیەنێ بەو ئاستەی کە ئالوبەیتو کەسو کاری ئەوانی تێدا گیرساونەتەوە، بەڵێ چۆن خودای گەورە جۆرە کەسانێکی پایەدارتری لەوانی تاقی کردەوە ئەمانیشی تاقی کردەوە، بێگومان عەلی کوڕی أبي طالب-ی باوکیان- لە هەردوکیان پایەدارتر بوو، بە شەهیدیش کوژرا.[1]

٧ـ بیرکردنەوە لە قەزای نوسراوو تێپەڕێنراو:

هەر کات موسڵمان بە یەقینەوە زانی کە ئەم کارەساتو موصیبەتانە پێشوەخت دیاری کراونو، لە (لوح المحفوظ) نوسراونو تێپەڕێنراون، هەروەها هەر دەمایەك ئەوەی بە زەینی خۆی داهێنا کە هەر شتێك خودا بڕیاری لەسەر دابێو تەقدیری کردبێو دەبێ هەر ببێو لەسەر زەوی واقیعدا بێتەدیو، خوداش لە میانەی بڕیاردانی لەسەر ئەو موصیبەتو کارەساتانە کۆمەڵێك حیکمەتی دیاری کردوون، بەڵێ هەر کاتێك کارەساتبار بیری لەم جۆرە شتانە کردەوەو بەسەر زەینی خۆیدا هێنان باری گرانی موصیبەتەکانی لەسەر سوك دەبێ.[2]

خودای بەرزو مەزن دەفەرمووێت: ﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مِّن قَبۡلِ أَن نَّبۡرَأَهَآۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ﴿٢٢﴾ لِّكَيۡلَا تَأۡسَوۡاْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمۡ وَلَا تَفۡرَحُواْ بِمَآ ءَاتَىٰكُمۡۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخۡتَالٖ فَخُورٍ ﴿٢٣﴾﴾[3] واتە: هەر کارەساتێکتان تووش دەبێ لە زەویدا (بە وشکەساڵیو بێ بارانیو فەوتانی سامانو خەڵەو خەرمانو ڕەزو باخ) ، لە خۆتاندا (بە نەخۆشیو لە دەستدانی ڕۆڵەو کەسو کار) ئیللا بەر لە دروستکردنی لە کتێبێکدا (بە ناوی لوح المحفوظ) نوسیومانە(و بڕیارمان لەسەر هاتنەدی داوە)، بێگومان ئەمە بە لای خوداوە ئاسانە، (ئەمەمان پێ ڕاگەیاندن) هەتا لە بەرانبەر لەدەستچوونی ئەو شتانەی زۆرتان خۆش دەوێنو بە لاتانەوە بە نرخن دڵتەنگ نەبنو خەفەت نەخۆنو، لە بەرانبەر دەستکەوتنی ئەو شتانەش کە بە لاتانەوە خۆشەویستو بەهادارن بەو جۆرە دڵخۆش نەبن کە سەرتان لە بوغراییو بێ نیازی بێنێتە دەر، خودا هیچ کامێك لە خۆبەزلزانو شانازیکەری خۆش ناوێن.

---

١ الفتاوى (٢٥/١٦٢).

٢ موسوعة الآداب الاسلامية (٢/٧٩٠).

٣ الحديد (٢٢ـ٢٣).

**٨ـ ڕای (إبن تیمیة)و (إبن کثیر) دەربارەی ئەوەی شیعە لە ڕۆژی عاشوڕادا دەیکەن:**

أـ إبن تیمیة دەڵێت: بە هۆی کوژرانی (حوسێن)ەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) شەیتان دوو بیدعەی بۆ خەڵك پەیدا کردوون، کە بریتین لە بیدعەی دڵتەنگی‌و شینگێڕان، لە ڕۆژی عاشوڕادا، ئەمانیش خۆیان لە لەخۆدان‌و هاتوهاوارو گریان‌و خۆتینوکردن‌و لاواندنەوەو سرودخوێندنەوەو شتانێکی تردا نیشان دەدەن‌و، هەموو ئەمانە سەردەکێشن بۆ بە لەعنەتکردن‌و جنێودان بە پێشینانی چاك‌و پاك‌و، حیسابکردنی کەسانی بێ گوناهو تاوان لەگەڵ خەڵکانی تاوانبار، بە چەشنێك دێن جنێو بە پێشەنگانی یەکەمین (السابقون الأولون) دەڵێن‌و حیکایەتی وا دەخوێننەوە کە زۆرینەیان درۆو بوختانن، ئیتر ئامانج لە دانانی ئەم ڕێوڕەسمە کردنەوەی دەروازەی ئاشوب‌و ئاژاوەی نێو ئوممەت‌و پەرتەوازەکردنیەتی، لە ڕاستیدا ئەمە بە یەکدەنگی‌و یەکهەڵوێستی موسڵمانان نە واجبەو نە سوننەتە، بەڵکو داهێنانی مەڕاسیمی هاتوهاوارو شینگێڕان بۆ کارەساتە کۆنەکان گەورەترین شتە لە نێو ئەو شتانەی کە خوداو پێغەمبەرەکەی بە حەرامیان داناون.[١] ئەوەی خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) فەرمانیان پێ کردووە لە بەرانبەر ڕوودانی موصیبەتی تازەدا بریتیە لە: ئارامگرتن‌و حیسابکردنی خەسارەکە لەسەر خوداو ذیکری (إسترجاع) واتە: (إنا لله وإنا إلیه راجعون).

جا ئەگەر خودا بۆ کارەساتێك کە لە نوێ ڕووی دابێ فەرمانی بە ئارامگرتن‌و حیسابکردنی خەسارەکە لەسەر خوداو ذیکری (إسترجاع) کردن بێ، ئەی دەبێ بۆ کارەساتێك کە لە زەمانێکی دوورو درێژو کۆندا ڕووی دابێ چ فەرمانێك بکات؟، ئا ئەوەی شەیتان لەبەر دڵو چاوی خەڵکانی گومڕای شیرین‌و جوان کردووە بریتیە لەوە ڕۆژی عاشوڕا بکەن بە ڕۆژی ماتەم‌و ئەنجامدانی هاتوهاوارو دادو فوغان‌و شینگێڕان‌و، خوێندنەوەی شیعری خەم‌و پەژارەئامێزو چیرۆکی وا کە درۆی زۆریان تێ دان‌و، فریان بەسەر ڕاستیەوە نیە، جگە لە نوێکردنەوەی خەم‌و دڵتەنگی‌و دەمارگیری‌و وروژاندنی ڕك‌و کینەو هەڵایساندنی ئاگری جەنگ‌و، ئاشوب خستنە نێو ئوممەتی ئیسلام‌و، دەستگرتن بە ئەمە بە خاتری جنێودان بە پێشەنگانی یەکەمین (السابقون الاولون)و، زۆرکردنی درۆو فیتنە لە دونیادا.[٢]

بـ (إبن کثیر)یش دەڵێ: پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێك بەڕوودانی کارەساتی کوشتنی ئەو (واتە حوسێن–ڕەزای خوای لێ بێت–) خەمبار بێ، چونکە ئەو هەم یەکێکە لە

---

١ منهاج السنة (٤/٥٥٤).

٢ الفتاوی (٢٥/١٦٥، ١٦٦).

سەییدو سەروەرانی ئوممەت، هەم یەکێکیشە لە هاوەڵە زاناکانو، کوڕی پایەدارترین کچی پێغەمبەری خودا (ﷺ)ەو، خواپەرستو ئازاو دلاوا بوو، بەلام ئەوەی شیعە دەیکەن لە دەرخستنی هاتوهاوارو دلتەنگی بۆی هیچ چاك نیە، بەلکو لەوانەیە زۆربەی زۆری ئەم ڕەفتارانەیان تەصەننوعو ڕیابازی بێ، باوکی لە ئەو جوامێرو پایەدارتر بوو، بەلام ئەوەی بۆ ڕۆژی تێداکوژرانی حوسێنی دەکەن بۆ ڕۆژی تێداکوژرانی عەلی ناکەن، کە لە ڕاستیدا باوکی لە بەرەبەیانی ڕۆژی هەینیو لە ١٧ رمضان/٤٠ی کۆچیدا کاتێك بۆ نوێژی بەیانی بەرەو مزگەوت دەڕۆیشت کوژرا. هەروەها (عثمان) بە لای (ئەهلی سوننەتو جەماعەت) لە علی پایەدارتر بوو، لە ڕۆژانی جەژنی قوربان (أيام التشريق)ی سالی ٣٦کۆچیداو بە گەمارۆدراوی کوژراو سەری گۆشاوگۆش لە جەستەی جودا کرایەوە، چ خەلکیش نەهاتن ئەو ڕۆژە بکەن بە ڕۆژی ماتەمی، هەروەها (عمری کوڕی خطاب)، لە (عثمانو عەلی) پایەدارتر بوو، لە کاتی بەرپاکردنی نوێژی بەیانیو لەو دەمەدا کە لەسەر پێ ڕاوەستابووو قورئانی دەخوێند کوژرا، خەلکیش نەهاتن ئەو ڕۆژە بکەن به ڕۆژی خەمو شیوەن، هەروەها صديق لە ئەو (واتە لە عمر) پایەدارتر بوو، خەلك نەهاتن ڕۆژی تێدا وەفاتی بکەن بە ڕۆژی ماتەمینی، پێغەمبەری خوداش (ﷺ) سەییدو سەروەری ڕۆلەکانی ئادەمە لە دونیاو قیامەت، چۆن پێغەمبەرانی پێش خۆی وەفاتیان کرد، ئەویش ئاوا گیانی کێشراو خودا بەرەو لای خۆی گێڕایەوەو، هیچ کەسێکیش نەهاتووە ڕۆژی تێدا مردنی بکاتە ماتەمینیو ئەو ڕەفتارانەی تێدا ئەنجام بدات کە ئەو نەفامە ڕافیزانە لە ڕۆژی مەرگەساتەکەی حوسێندا ئەنجامی دەدەن. نەشهاتوون وەك جاڕچیانی کوژرانی حوسێن بلێن لە ڕۆژی کوژرانی حوسێندا چەند شتێکی وەك خۆرگیرانو دەرکەوتنی سورایی لە ئەشقی ئاسمانو شتانی تریش ڕوویانداوە.[1]

چاکترین شتێك لە کاتی بەبیرهاتنەوەی ئەم کارەساتانەو شێوەکانیان بوترێ ئەم ذیکرو نزایەیە کە (حوسێنی کوڕی عەلی) لە باپیری (ﷺ)ەوە گێڕاویەتیەوە، کە دەفەرموێت: ((مَنْ أُصِيبَ بِمُصِيبَةٍ فَذَكَرَ مُصِيبَتَهُ فَأَحْدَثَ اسْتِرْجَاعاً وَإِنْ تَقَادَمَ عَهْدُهَا كَتَبَ الله لَهُ مِنَ الأَجْرِ مِثْلَهُ يَوْمَ أُصِيبَ))[2] واتە: هەر موسلمانێك کارەساتێکی تووش ببوو، وەختێك بەبیری هاتەوە ئەگەرچی لە مێژیش بێ بەسەرهاتبێ، جا وتی: (إنا لله وإنا إليه راجعون) ئیللا خودا جۆرە پاداشتێکی وای پێ دەبەخشێت کە بە قەد پاداشتی ئەو ڕۆژە بێ کە تێیدا تووش بووبێ.

---

١ البداية والنهاية (١١/٥٧٩).

٢ سنن إبن ماجة (رقم: ١٦٠٠)، في إسناده ضعف. ضعيف سنن إبن ماجة (رقم: ٣٤٩).

(إبن تيمية) قسە لەسەر ئەم حەدیسە دەکاتو دەڵێ: ئەمە فەرموودەیەکە فاطمەی کچی حوسێن لە حوسێنی باوکیەوە گێڕاویەتیەوەو، بە خودی خۆی ئامادەی مەشهەدی کوژرانی باوکی ببوو، لێرەدا وا زانرا کە کارەساتی کوژرانی حوسێن -ئەگەرچی زۆریش لە مێژ ڕوویدا بێت- دێتەوە یاد، یەکێك لە ئادابە جوانەکانی ئیسلام ئەوە بوو کە حوسێن ئەم سوننەتە لە پێغەمبەری خودا (ﷺ)ەوە بە خەڵك بگەیەنێ کە بریتیە لەوە: هەر کاتێك مرۆڤی موسڵمان ئەم موصیبەتەی لە لا باس کرا، ذیکری (إنا لله وإنا إليه راجعون) بکات، ئیتر ئەو دەمە پاداشتی بە قەد پاداشتی ڕۆژی ڕوودانی کارەساتەکە دەست دەکەوێ، بەڵام هەر کەسێك لەگەڵ کۆن بوونی کارەساتەکەدا ڕەفتار یان گوفتارێك ئەنجام بدات کە پێغەمبەر (ﷺ) بۆ کاتی گەرمەی کارەساتەکە قەدەغەی کردبێ، لە وێنەی لە ڕوومەتدانو ئێخەدڕاندنو سینگکوتانو هاتوهاوارو بانگلێدانی شێوەی بانگ لێدانی سەردەمی نەفامی، ئەوا ئەو کاتە سزایەکە توندتر دەبێ.[١]

٩- کێ عاشوڕا دەکات بە جەژن؟

تاقمی (نواصب) عاشوڕا دەکەن بە جەژن، (نواصب) لە ڕیزی گرۆهەکانی ئەهلی بیدعەیەو بیروباوەڕیان لە بەرانبەر هاوەڵانی بەڕێزدا (ڕەزای خوایان لێ بێت) لەگەڵ بیروباوەڕی ڕاستو دروست تێك ناکاتەوە، شەیتان خۆشنەویستی (عەلی)ی ئەمیری ئیماندارانی بۆ ڕازاندوونەتەوەو، وای لێ کردوون ڕق لێبوونەوەو دوژمنایەتی کردنیو وتنی قسەگەلێك لەسەری -کە ئەو تێیدا بەرییە- بە دینداری بزانن، ئەم بوغزو غەرەزەیان بۆ (عەلی) سەری کێشاوە بۆ ئەندامامی خانەوادەکەشی بە تایبەتی حوسێنی کوڕی عەلی (ڕەزای خوای لێ بێت)، وشەی (النصب) بوغزاندنو زەبروەشاندنو لادان لە (عەلی) دەگەیەنێ، هەر کەسێك ئەم صیفەتانەی تێدا بووبن، بە (ناصبي) ناسراوە، (نَصْب)یش وەك (رَفْض) وایە (رَفْض)یش بریتیە لە بوغزاندنو زەبروەشاندنو جوێندان بە هاوەڵانی پێغەمبەری خودا (ﷺ)، کەواتە هەردووك لایان چ (ناصبة)کانو چ (رافضة)کان سەبارەت بە واجیبوونی خۆشویستنی هاوەڵانی پێغەمبەری خودا (ﷺ)و ناسینی ئەوان وەك خۆیان کە باری پێشەنگایەتییان پێ دراوە لە ئیسلامدا، بە گیانوماڵو سامانیان لە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)دا بوونو جەنگو جیهادیان کردووە، بەڵێ سەبارەت بە هەموو ئەم شتە

---

١ الفتاوى (٤/٣١٢).

بەلگەنەویستانە سەریان لێ شێواوەو گومڕا بوونو لە بەرنامەی خودا دوورکەوتوونەتەوە.[1]
جا ئەگەر شیعە عاشوڕای کردبێ بە ڕۆژی شینو شیوەن، ئەوا لە بەرانبەر ئەواندا تاقمێکی تر کردوویانە بە ڕۆژی جەژنو شادی، جا ئەمانەی ئەمە دەکەن، یان لەو (نواصب)انەن کە لە بەرانبەر حوسێنو بنەماڵەکەیدا داخدارو ڕقئەستوورن، یان لەو نەفامانەن کە ویستوویانەو دەیانەوێ بە خراپە لە بەرانبەر خراپەداو بە درۆ لە بەرانبەر درۆداو بە شەڕ لە بەرانبەر شەڕداو بە بیدعە لە بەرانبەر بیدعەدا بوەستنەوە، هاتوون بۆ دەرخستنی دروشمی جەژنو شادمانی لە ڕۆژی عاشوڕادا چەند نیشانەیەکیان داناون وەك: چاوڕشتن یان کل لە چاوکردن، خەنەبەندان، بە شینەوەی پارەو پۆشاکی جوان بەسەر خاووخێزاندا، لێنانی چێشتی شازو خۆراکی هەمەڕەنگ و ئامادەکردنی چەندین شتی تر کە خەڵك لە جەژنەکانیاندا ئەنجامی دەدەن، ئیتر تا ئەم تاقمە بە چەشنی جەژنەکانی تر ڕۆژی عاشوراشیان کردووە بە وەرزی ئاهەنگو جەژنو شادی لە بەرانبەر ئا ئەوانەی کردوویانە بە ڕۆژی خەمو ماتەمینی، دیارە ئەمە بیدعەی دووەمەو بۆ پاساوی شەرعاندنی ئەم کارەیان چەندین حەدیسی هەڵبەستراویان هێناون وەك ئەمانە:

أ- حەدیسی ((من وسع على عياله يوم عاشوراء وسع الله عليه سنته))[2] واتە: هەر کەسێك لە ڕۆژی عاشوڕادا مەسرەفی چاك بۆ خێزانەکەی بکات، خوا لەو ساڵەدا سامانی بەرفرەی بەسەردا دەڕێژێت.

ب- داهێنانی نوێژێکی تایبەت لە شەوو ڕۆژی عاشوڕادا:

لە (أبو هريرة)ەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ)فەرموویەتی: ((من صلى لله يوم عاشوراء ما بين الظهر والعصر، أربعين ركعة، يقرأ في كل ركعة بفاتحة الكتاب مرة واية الكرسي عشر مرات وقل هو الله أحد إحدى عشرة مرة والمعوذتين خمس مرات، فإذا سلم أستغفر سبعين مرة أعطاه الله في الفردوس قبة بيضاء))[3] واتە: هەر کەسێك لە ماوەی نێوان نیوەڕۆو عەصری ڕۆژی عاشوڕادا چل ڕکات نوێژ بکاتو، لە هەر ڕکاتێکدا جارێك فاتیحەو دە جار ئایەتولکورسیو یازدە جار قل هو الله أحدو پێنج جار مەعوزەتەین بخوێنێتو دوای سەلامدانەوەش حەفتا جار بڵێ: (أستغفر الله) ئەوا لە بەرانبەر ئەمەدا خودا

---

١ عقيدة أهل السنة والجماعة في الصحابة الكرام (٣/١١٩٣، ١١٩٤).
٢ الموضوعات لإبن الجوزي (٢/٢٠٣).
٣ الموضوعات لإبن الجوزي (٢/١٢٢، ١٢٣).

کۆشکێکی لە شێوەی گومبەزێکی سپیدا پێ دەبەخشێت. جگە لەمەش چەندین بیدعەی تریان لەم ڕۆژەدا داهێناون کە فڕیان بەسەر دینی خودای گەورەو بە دەستەڵاتەوە نیە.[١] سەبارەت بەم ڕەفتارانەی خەڵك لە ڕۆژی عاشوڕادا دەیکەن، لە چاوڕشتنو خەنەبەندانو خۆشۆرینو تۆقەکردنو دانوله کوڵاندنو دەربڕینی خۆشیو شادومانیو گەڕانو سوڕان بەنێو جادەو کۆڵانو بەرو بازاڕدا، پرسیار لە (إبن تیمیة) کرا: ئایا دەربارەی ئەمە هیچ حەدیسی ڕاستو دروست (صحیح) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتوون؟ ئەگەر حەدیسی صەحیحیان لەسەر نەهاتبێ ئایا بە بیدعە دادەنرێن یان نا؟ لە وەڵامدا وتی: سوپاسو ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانەکان، سەبارەت بە ئەمە هیچ حەدیسی صەحیح نە لە پێغەمبەر (ﷺ)ە وەهاتووە نە لە هیچ کام لە هاوەڵانیشەوە بیستراوە، هیچ کامێك لە تەواوی ئیمامانی ئیسلامو چوار ئیمامەکەو غەیری ئەوانیش ئەمەیان بە سوننەت دانەناوە، هیچ حەدیسێك لەمانە نە بە صەحیحیو نە بە زەعیفی لە پێغەمبەر (ﷺ)و هاوەڵانو شوێنکەوتووانەوە نەگێڕدراوەتەوەو، لە هیچ کامێکیش لە کتێبە پشت پێ بەستراوەکانی (صحیحو سننو مسانید)دا بوونیان نیەو، هەروەها هیچ کامێك لەم بەناو حەدیسانە: لە سەردەمی سەدە زێڕینەکانیشدا پەیدا نەبووبوون، بەڵکو ئەم بیدعانەی ڕۆژی عاشوڕا لە کوفەدا سەریان هەڵدا، چونکە ئەوێ دوو تاقمەی دژ بە یەکی تێدا بوون: یەکیان تاقمەی (ڕافیزە) بوونو بە ڕواڵەت خۆشەویستیو هەواداری خۆیان بۆ (ئالوبەیت) دەردەبڕی، لە ڕاستیدا ئەم تاقمە لە ناخیاندا یان بێباوەڕو زندیق بوون یان نەفامو ئارەزووپەرست بوون. دووەمیان: تاقمەی (ناصبة) بوون، ئەمانە دەراویشتەو سەرکوێرزی جەنگەکانی نێوخۆ بوونو بە هۆی ئەمە ڕقیان لە عەلیو هاوەڵانی دەبۆوە.[٢]

کاتێکیش دەمارگیری لە نێوان ناصیبەکانو ڕافیزەکان-ی کوفە- پەیدا بوو، هەریەکەیان لە ڕاست خۆیەوە بە بۆنەی ڕێوڕەسمی عاشوڕا دەستیان بە دانانی حەدیس کرد، ڕافیزەکان عاشوڕایان کرد بە ڕۆژی ماتەمینیو، پڕ بە پێستی ئەمە حەدیسیان بۆ هەڵبەستن، ناصیبەکانیش کردیان بە جەژنو حەدیسگەلێکی زۆریان بۆ پەرەپێدانی ئەمە هەڵبەستن، بێگومان هەردووك لایان ناهەقن، هەم ئەم لایان بیدعەو گومڕاییان تێدایە هەم

١ المدخل لإبن الحاج (١/٢٩٠، ٢٩١)، الأعياد (ص: ٢٧٤).
٢ الفتاوى (٢٥/١٦١).

ئەو لایان بیدعەو گومراییان تێدایە.[١] جا کەواتە هەر کەسو گروهێك عاشوڕای کردبێ بە ڕۆژی جەژنو شادیو دڵخۆشی ئەوە داهێنانی لە دیندا ئەنجام داوەو، لە سوننەتی سەروەری پێغەمبەران لایداوە.[٢]

١٠ـ ڕێنمایی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ڕۆژی عاشوڕا:

عاشوڕا یەکێکە لە ڕیزی ڕۆژە مەزنو زێڕینەکان ، پێغەمبەر (ﷺ) هانی ئوممەتی داوە بایەخی پێ بداتو تێیدا بە ڕۆژوو ببێ، قەتادە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: ((ثَلاَثٌ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ. وَرَمَضَانُ إِلَىَ رَمَضَانَ. فَهَذَا صِيَامُ الدّهْرِ كُلّهِ. صِيَامُ يَوْمِ عَرَفَةَ، أَحْتَسِبُ عَلَىَ اللّهِ أَنْ يُكَفّرَ السّنَةَ الّتِي قَبْلَهُ. وَالسّنَةَ الّتِي بَعْدَهُ. وَصِيَامُ يَوْمِ عَاشُورَاءَ، أَحْتَسِبُ عَلَىَ اللّهِ أَنْ يُكَفّرَ السّنَةَ الّتِي قَبْلَهُ.))[٣] واتە: بەڕۆژووبوونی سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێکداو ڕەمەزان بۆ ڕەمەزان، ئەمە ئەمە بریتیە لە بەڕۆژووبوونی هەموو ژیانی دونیا، بەڕۆژووبوون لە ڕۆژی عەرەفەدا لەسەر خودای حیساب دەکەم کە گوناهی ساڵێکی پێشداو هی ساڵێکی دوای خۆی بسڕێتەوەو، بەڕۆژووبوون لە ڕۆژی عاشوڕادا، لەسەر خودای حیساب دەکەم کە گوناهی ساڵێك بەر لە خۆی بسڕێتەوە.

عبدالله ی کوڕی عباس (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ)م نەبینیوە لە ڕۆژێك بگەڕێتو هەڵی بژێرێت بەسەر ڕۆژەکانی تردا تا تێیدا بەڕۆژووبێ جگە لە ئەم ڕۆژە – واتە ڕۆژی عاشوڕا–، هەروەها نەمبینیوە لە مانگێك بگەڕێتو هەڵی بژێرێت بەسەر مانگەکانی تردا تا تێیدا بەڕۆژوو بێ جگە لە ئەم مانگە –واتە مانگی ڕەمەزان–.[٤] کەواتە شتێك لەو ڕۆژەدا سوننەت بێ تەنها ڕۆژووە، پێغەمبەر (ﷺ) تێیدا بەڕۆژوو بووەو، وەك لە حەدیسەکەی پێشدا دەرکەوت هەواڵی داوە، کە بەڕۆژوو بوون تێیدا خێرێکی زۆر گەورەیەو، فەرمانیشی بە موسڵمانان کردووە تێیدا بەڕۆژوو بن، دەربارەی ئەمە چەندین حەدیسی صەحیح هاتوون، بۆ نموونە:

أ‌ـ عبدالله ی کوڕی عمر (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێ: خەڵکی سەردەمی نەفامی ڕۆژی عاشوڕا بەڕۆژوو دەبوون، بەر لەوە بەڕۆژووبوونی مانگی ڕەمەزان فەرز بکرێت. پێغەمبەر (ﷺ) تێیدا بەڕۆژوو دەبوو، کە ڕەمەزان فەرز کرا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((" إنّ

---

١ إقتضاء الصراط المستقيم (٢/٦٢٢، ٦٢٣).

٢ الأعياد وأثرها على المسلمين (ص: ٢٧٦).

٣ مسلم (رقم: ١١٦٢).

٤ البخاري (رقم: ٢٠٠٦).

عَاشُورَاءَ يَوْمٌ مِنْ أَيَّامِ اللّٰهِ. فَمَنْ شَاءَ صَامَهُ، وَمَنْ شَاءَ تَرَكَهُ))[١] واتە: عاشورا یەکێکە لە ڕۆژەکانی خودا، جاکێ حەز دەکات با تێیدا بەڕۆژوو بێ، کێش حەز دەکات با وازی لێ بێنێ.

ب- عبدالله ی کوڕی عباس (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) تەشریفی هاتە مەدینە، بینی جولەکە لە ڕۆژی عاشورادا بە ڕۆژوو دەبن فەرمووی: (ما هذا؟) ئەمە چیە؟، وتیان: ڕۆژێکی پیرۆزە، لەم ڕۆژەدا خودا بەنی ئیسرائیلی لە چنگ دوژمنەکەیان ڕزگارکردن‌و -بەم بۆنەوە- موسا تێیدا بەڕۆژوو بوو، فەرمووی: ((فَأَنَا أَحَقُّ بِمُوسى مِنْكُمْ))من لە ئێوە زیاتر هەقم بەسەر موساوە هەیەو لە ئێوە لێی نزیکترم، جا بۆ خۆی ڕۆژووی تێدا گرت‌و فەرمانی بە موسڵمانان کرد تێیدا بەڕۆژوو بن، هەر عبدالله دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی بە گرتنی ڕۆژووی ڕۆژی دەیەمی عاشورا کرد.[٢]

ج-عبدالله ی کوڕی عباس (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێ: کاتێك پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە ڕۆژی عاشورادا بەڕۆژوو بوو فەرمانی بە گرتنی -ئەو ڕۆژوە- کرد، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ئەمە ڕۆژێکە جوولەکەو نەصرانی بە گەورەی دادەنێن، جا پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: ((فَإِذَا كَانَ الْعَامُ الْمُقْبِلُ صُمْنَا يَوْمَ التَّاسِعَ إِنْ شَاءَ اللّٰهُ)) واتە: إن شاء الله ساڵی ئایندە نۆیەش بەڕۆژوو دەبین، (عبدالله) وتی: ساڵ وەرنەسوڕایەوە تا پێغەمبەری خودا (ﷺ) وەفاتی فەرموو. بە گوێرەی ڕیوایەتێکی دی فەرمووی: ((لَئِنْ بَقِيتُ إِلَى قَابِلٍ لأَصُومَنَّ التَّاسِعَ))[٣] واتە: ئەگەر تا ساڵێکی تر مام ڕۆژی نۆیەش بە ڕۆژوو دەبم. هەر عبدالله دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((صُومُوا يَوْمَ عَاشُورَاءَ وَخَالِفُوا فِيهِ الْيَهُودَ ، صُومُوا قَبْلَهُ يَوْمًا أَوْ بَعْدَهُ يَوْمًا))[٤] واتە: ڕۆژی عاشورا بەڕۆژوو بن‌و، پێچەوانەی جوولەکە بکەن ڕۆژێك لە پێشداو ڕۆژێك لە دوایدا بەڕۆژوو بن.

زانایان وتوویانە کە ڕۆژووی عاشورا سێ پلەی هەیە:

أ- بەڕۆژوو بوون لە ڕۆژانی (٩، ١٠، ١١)دا بەپێی حەدیسی: (صُومُوا قَبْلَهُ يَوْمًا وَ بَعْدَهُ يَوْمًا).

---

١ مسلم (رقم: ١١٢٦).

٢ مسلم (رقم: ١١٣٤).

٣ مسلم (رقم: ١١٣٤).

٤ السنن الكبرى للبيهقي، كتاب الصيام (٤/٢٨٧).

ب ـ بەڕۆژووبوون لە ڕۆژانی (٩، ١٠)دا، بە پێی حەدیسی: ((فَإِذَا كَانَ الْعَامُ الْمُقْبِلُ صُمْنَا يَوْمَ التَّاسِعَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ)).

ج ـ بەڕۆژووبوون تەنها لە ڕۆژی (١٠)ی عاشوڕادا: بە پێی هەموو ئەو فەرموودانەی جەخت لەسەر ڕۆژوو تێداگرتنی دەکەنەوە.[1]

ئەمەی ڕابرد ڕێنماییەکانی پێغەمبەری خودا بوون (ﷺ) بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ڕۆژی عاشوڕا، لێرەدا میانەڕەوی ئەهلی سوننەتو جەماعەت دەردەکەوێت، کە نە زێدەڕۆییان پێوە دیارەو نە کەمتەرخەمی، بەڵکو لەپێناو بەدەستخستنی پاداشتی خودای گەورە دەستیان بە سوننەتی پێغەمبەری خودا (ﷺ)ەوە گرتووەو فەرمانەکانی جێبەجێ دەکەن.

## دووەم: سۆراخکردنی شوێنی سەری حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت):

هۆکاری سەرهەڵدانی جیاوازی سەبارەت بە شوێنی سەری حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) دەگەڕێتەوە بۆ هەبوونی ئەو هەموو مەرقەدو مەزارگایانەی لە سەردەمی دواکەوتنی فیکریو عەقیدەییدا لە وڵاتانی ئیسلامدا بۆی دروست کراون، ئیتر هەر یەکێك لەو وڵاتانە جاڕ دەدا کە سەری حوسێن لەوێدایەو، خولانەوە لە بازنەی نەزانیدا سەبارەت بە شوێنی سەری حوسێن وای لەو تاقمانە کردووە کە هەریەکێکیان بانگەشە بکاتو بڵێ سەری حوسێن لە وڵاتی منە، ئەگەر ئێمە بمانەوێ سۆراخی ئەو شوێنە بکەین دەبێ بێینو دوای کۆتایی جەنگی کەربەلا هەنگاو بە هەنگاو بەدواداچوون بۆ هەبوونی سەرەکە بکەین.[2]

تا ئێرە زانرا کە سەری حوسێنیان بۆ لای ئیبنو زیاد هێنا، لەنێو تەشتێکدا دانرابوو، ئیبنو زیاد بە شوڕکەدار یان سەرە نێزەیەك کە بە دەستیەوە بوو لێی دەداو دەمو لێوی هەڵدەدانەوە، ئەنەسی کوڕی مالك (ڕەزای خوای لێ بێت) لێی ڕاست بۆوەو وتی: لە هەمووان زیاتر بە پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەچوو.[3] ئەمجا دوای ئەمە ڕیوایەتو بۆچوونەکان سەبارەت بە ئاکامی سەری حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) جیاوازیەکی زۆریان تێکەوتووە، بەڵام دوای لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو ڕیوایەتانەی کە دەڵێن ئیبنو زیاد سەرەکەی بۆ لای یەزیدی کوڕی معاویە ناردووە، بینیم ڕیوایەتەکان بەم جۆرەن: لێرەدا چەند ڕیوایەتێك هەن باس لەوە دەکەن کە ئیبنوزیاد سەری حوسێنی بۆ لای یەزید ناردووەو یەزید قەمچیەکی بە

---

١ زاد المعاد (٢/٧٦)، فتح الباري (٤/٢٤٦).

٢ مواقف المعارضة (ص: ٣٠٦).

٣ سنن الترمذي (٥/٦٥٩)، حسن صحيح غريب.

دەستەوە بووەو لە دەمو لێوی دەخشاندن، کار بەوە گەیشت (أبو برزةی أسلمی) (ڕەزای خوای لێ بێت) لێی ڕاست بێتەوەو سەبارەت بەم کارەی ڕەخنەی توندی ئاراستە بکات، بەڵام خودی ئەم ڕیوایەتە کە دەڵێ لەگەڵ گەیشتنی سەرەکە یەزید بەم چەشنە هەڵسوکەوتی لەگەڵ کردوە زەعیفو لاوازە.[١] (إبن تيمية) بەڵگەی لەسەر لاوازی ئەم ڕیوایەتە هێناوەتەوەو دەڵێ: ئەو هاوەڵانەی کە لە کاتی قەمچی لە دەم دانەکەدا ئامادە بوون لەو دەمە هیچیان لە شام نەبوون، بەڵکو لە عێراق بوون.[٢] شتێکی تریش کە دەبێتە بەڵگە لەسەر گەندەڵی مەتنی ڕیوایەتەکە ئەوەیە: کە سەرتاپا دژایەتی لەگەڵ ئەو ڕیوایەتە صەحیحو ڕاستو دروستانەدا هەیە، کە بە ڕاشکاوی دەڵێن: یەزید ڕەفتارێکی جوانو ناوازەی لە بەرانبەر خانەوادەی حوسێندا نواندووەو، پەرۆشی خۆی بۆ حوسێن نیشان داوەو بۆی گریاوە.[٣] (إبن تيمية) دەڵێ: بە ڕیوایەتی صەحیحو ڕاستو دروست چەسپاوە کە سەری حوسێن تەنها بۆ لای ئیبنو زیاد براوەو، هەر ئەویش بووە کە بە سەری شوڕکەدار لێی داوە.[٤] بەڵام ئەو ڕیوایەتەی کە دەڵێ هەڵگیراوەو بۆ لای یەزید ڕەوانە کراوە فری بەسەر ڕاستیەوە نیەو، زنجیرەی سەنەدەکەی پچڕپچڕ (منقطع)ە[٥].(إبن كثير) دەڵێ زانایان سەبارەت بە ئەمە کە ئایا دەبێ ئیبنو زیاد سەری حوسێنی بەرەو شام ڕەوانە کردبێ یان نا؟ دوو ڕای جیاوازیان هەیە، بەڵام ئەو ڕایەیان بەهێزترە کە دەڵێ بەڕێی کردووە، ئەمە لە ڕیوایەتگەلێکی زۆردا هاتووەو والله أعلم.[٦] (الذهبي)یش هەر لەسەر ئەم ڕایەیە.[٧]

دەڵێن سەری حوسێن لە شەش شاردا گۆڕی هەیە:

أ- دیمەشق: (بەیهەقی) لە (المحاسن والمساوی)دا ڕیوایەت دەکات: یەزید فەرمانی بە شۆرینی سەرەکە کردو خستیە نێو پارچە پۆشاکێکی ئاوریشمەوەو، خێمەیەکی لەسەر هەڵداو پەنجا پیاوی -وەك پاسەوان- بە سەرەوە دانان،[٨] (إبن عساكر) بە ڕیوایەتی خۆی لە

---

١ المجمع (٩/١٩٥)، فيه إنقطاع.
٢ منهاج السنة (٤/٥٥٧).
٣ مواقف المعارضة في خلافة يزيد (ص: ٣٠٨).
٤ منهاج السنة (٨/١٤١).
٥ منهاج السنة (٨/١٤٢).
٦ البداية والنهاية (١١/٥٨٠).
٧ تأريخ الاسلام (٦١_٦٨).
٨ المحاسن والمساوي (ص: ٨٤)، بدون إسناد.

(ریا)ی دایەنی یەزیدی کوڕی معاویەوە گێڕاویەتیەوە، کە سەری حوسێن هەتا سەردەمی خیلافەتی سولەیمان-ی کوڕی عبدالملك- لە ژووری کۆگای چەکدا هەڵگیرابوو، ناردی بۆی بێنن، کە هێنایان تەنها ئێسقانەکەی مابۆوە، جا بۆنێکی خۆشی لێ داو کفنی کردو ناشتی، کاتێك هێزی موسوەدە[1] گەیشت، پرسیاریان کرد سەری حوسێن لە کوێیە؟ ئیدی دەریان هێناو هەر خودا بۆ خۆی دەزانێ چی بەسەر هێنرا؟[2] ئەم ڕیوایەتە کە (إبن عساکر) لە (ریا)وە هێناویەتی باسی هەڵسەنگاندن (جەرحو تەعدیل)ی تێدا نەکراوە، کەواتە نەناسراو (مجهول)ە.[3] کەواتە ڕیوایەتێك لە بناغەوە ڕووخابێ بە هیچ شێوەیەك لە شێوەکان پشتی پێ نابەسترێ.[4]

(الذهبي) بە سەنەدی خۆی لە (أبی کریب)ەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: من لە ڕیزی ئەو سەربازانەدا بووم کە لە دیمەشق هەڵمان کوتایە سەر وەلیدی کوڕی یەزید، صندوقێکی هەڵگرتو وتم، ئیدی تەواو دەوڵەمەند بووم، سواری ئەسپەکەم بوومو، لە دەرگای (توما)وە دەرچووم، وتی: جا کردمەوە، دەبینم سەرێکی تێدایەو بە سەریەوە نووسراوە: ئەمە سەری حوسێنی کوڕی عەلییە، بە شمشێرەکەم گۆڕم بۆ هەڵکەندو ناشتم.[5] ئا ئەم ڕیوایەتە زۆر زۆر لاوازە.[6] لە لایەکی ترەوە چ سودێك لەوەدا بووە بۆ یەزید، کە سەری حوسێن لە لای خۆی بهێڵێتەوەو لە چەکخانەدا بیپارێزێت؟[7]

٢ـ کەربەلا: جگە لە شیعەی ئیمامی هیچ کەسو لایەنێك نەیوتووە سەری حوسێن لە کەربەلایە، ئەوان دەڵێن: سەری حوسێن دوای تێپەڕینی چل ڕۆژ بەسەر کوژرانیدا بۆ کەربەلا گێڕدراوەتەوە و بە تەك جەستەی حوسێنەوە نێژراوە.[8] ئەمە ئەوەیە کە بە سەردانی چلە (زیارة الأربعین)ی ناو دەبەن، ئیتر ئەمەندە قسە بەسە، چونکە شیعەی ئیمامی بە تەنها ئەمە دەڵێنو، جگە لە چەند وتەیەکی لاوازی دوور لە ڕاستی هیچ بەڵگەیەکی بەهێزیان نیە،

---

١ موسوەدە: واتە سەربازانی عەباس، ئەو دروشمە بوو کە عەباسیەکان بەرزیان کردبۆوە.

٢ تأریخ إبن عساکر، تراجم النساء، نقلا عن مواقف المعارضة (ص: ٣١١).

٣ مواقف المعارضة (ص: ٣١٢).

٤ مواقف المعارضة (ص: ٣١٣).

٥ اسیر (٣/٣١٦)، سمط النجوم العوالي (٣/٨٦).

٦ مواقف المعارضة (ص: ٣١٣).

٧ مواقف المعارضة (ص: ٣١٣).

٨ مواقف المعارضة (ص: ٣١٣)، نور الأبصار (ص: ١٢١).

(أبو نعيم الفضل بن دكين) بە توندی بەگژ ئەوانەدا چوو کە پێیان وایە بە گۆڕی جەستەی حوسێن دەزانرێت.[١] (إبن جرير)و خەڵکانی تریش دەڵێن بە خاتری ئەوە کەس نەتوانێت گۆڕی حوسێن دیاری بکات هاتوون شوێنەواری تێداکوژرانەکانیان کوێر کردوونەتەوە.[٢]

٣ـ الرقة: سبط بن الجوزي بە تاکی تەنیا ڕیوایەتێك دێنێ کە باس لەوە دەکات گۆڕی حوسێن لە (رقە)یە ئەو دەڵێ: سەرەکە لە مزگەوتی (رقە)ی سەر ڕووباری فوڕاتەو لە لایەن یەزیدی کوڕی معاویە ڕەوانەی ئەوێ کراوە، (یەزید) وتبووی: بەخوا بۆ لای (آل أبي معيط)ی دەنێرم لە (رقە)، ئەوانیش لە یەکێك لە خانووەکانی خۆیاندا ناشتیان، ئەمجا مزگەوت بەرفراوان کراو خانووەکەش چووە نێو مزگەوتەکەوەو گۆڕەکەش کەوتە تەنیشت دیواری حەوشەی مزگەوت.[٣] ئەم ڕیوایەتە لە ڕاستیەوە دوورە، چونکە لە لایەکەوە بێ سەنەدەو لە لایەکی تریشەوە نامۆیی پێوە دیارەو پێچەوانەی ئەو دەقە ڕاستو دروستانەیە کە هەڵوێستی جوانی یەزید لە بەرانبەر خانەوادەی حوسێنو پەرۆش بوونو پەشێمانی ئەو بۆ کوژرانی حوسێن دەسەلمێنن.[٤] ئەمە لەگەڵ ئەمەدا کە (الذهبي) ئەم وتەیەی سەبارەت بە (سبط إبن أبي الجوزي) وتووە: کتێبێکی ئەوم بینیوە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە بوویێتە شیعە.[٥]

٤ـ عەسقەلان: ژمارەیەك لێکۆڵەر بە توندی بەرپەرچی ئەو هەواڵەیان داوەتەوە کە دەڵێ: سەری حوسێن لە عەسقەلان نێژراوە، قورتوبی دەڵێ: هەر قسەیەك سەبارەت بە ئەمە کرابێ کە لە عەسقەلانە پووچو بێ بەڵگەیە.[٦] (إبن تيمية)ش لاموجیمی ئەوە دەکات کە لە عەسقەلان بێ.[٧] (إبن كثير)یش بە دوای ئەودا هەمان هەڵوێستی نواندووە.[٨]

٥ـ قاهیرە: وەکو دیارە ئەو گاڵتەبازیەی عەبیدیەکان ئەنجامیان دا، خەڵکانێکی زۆری پێ هەڵخەڵەتان، دوای ئەوە خاچپەرستەکان لە ساڵی ٥٤٠ کۆچیدا بڕیاریاندا دەست بەسەر

١ تأريخ بغداد (١/١٤٣ـ١٤٤)، ترجمة الحسين (ص: ٢٧٦).
٢ البداية والنهاية (١١/٥٨٠).
٣ شخصيات اسلامية (٣/٢٩٨) للعقاد، مواقف المعارضة (ص: ٣١٤).
٤ مواقف المعارضة (ص: ٣١٤).
٥ السير (٢٣/٢٩٧).
٦ التذكرة (٢/٢٩٥).
٧ تفسير سورة الإخلاص لإبن تيمية (ص: ٢٦٤).
٨ البداية والنهاية (١١/٥٨٢).

عەسقەلاندا بگرن، (صالح طلائـعی کوڕی زریك)ی وەزیری فاطمی بە خۆی‌و بە سەربازەکانیەوە بە پێخواسی بەرەو (صالحیة) دەرچوو، سەری حوسێنی هەڵگرت‌و خستیە نێو کیسەیەکی ئاوریشمی سەوزەوەو لەسەر کورسیەکی (ئابنوس)و فەرشێکی دانا کە لە ژێریەوە میسك‌و عەنبەرو بۆنی خۆش دانرابوو، ئەمجا بەم چەشنە لە ڕۆژی یەك شەممەو ٨/جمادی دووەم/٥٤٠ کۆچیدا لەو شوێنەی کە ئێستا پێی دەوترێ (مەشهەدی حوسێنی)ی نزیك لە (خان الخلیلی) ناشتی.[1] (القارفي) دەڵێ: خەلیفەی دەوڵەتی (فاطمي) بە خودی خۆی دەرچوو سەرەکەی هەڵگرت.[2]

(الشبلنجي) دەڵێ: دوای ئەوە فەرەنگ عەسقەلانیان داگیر کرد، (صالح طلائـع)ی وەزیر توانی بە سامانێکی زۆر شایستە سەری حوسێنیان لێ بکڕێتەوەو لەم کارەشیدا سەرکەوتوو بوو.[3] هەندێك مێژوونووس هەوڵیان داوە جەخت لەسەر ئەوە بکەنەوە کە سەری حوسێن بە فیعلی لە عەسقەلانەوە بەرەو مصر گوازراوەتەوەو، گومبەزی مەشهەدی حوسێن-ی قاهیرە-ش ڕاستیەکی حاشاهەڵنەگرە کە لەسەر گۆڕی سەری حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) دروست کراوە.[4] (حوسێن محمد یوسف) کە یەکێکە لە مێژوونووسە تازەکان -بە حیسابی خۆی- سەلماندوویەتی کە ئەو سەرەی لە مەشهەدی حوسەینی نێژراوە، بە ڕاستی سەری حوسێنەو هەر کەسێکیش شتێکی تر بڵێ هەڵە دەکات، بەڵگەی بۆ ئەمە بریتیە: لەو خەون‌و کەشفانەی کە بۆ هەندێك لە صۆفیەکان هاتوونەتەدی‌و، لەو خەونانەدا هاتووە: ئەم سەرە بە ڕاست‌و دروستی هی حوسێنە، ئەمجا بۆ پشتگیری کردنی ڕایەکەی هاتووە ڕێسا (قاعدە)یەکی نوێی داهێناوەو دەڵێ: سەرەکە لە قاهیرەیە، بە هۆی ئەو گومانانەی کە لەگەڵ یەقیندا دژایەتیان هەیە، یەقینیش بریتیە لە ڕای کەسانی خاوەن کەشف‌و کەرامەت.[5]

لە ڕاستیدا ئەم بەڵگەو بەڵگەهێنانەوە ناچێتە ژێر باری هیچ کامێك لە پێوانەکانی عەقڵ‌و منطق، چ جای ئەوە کە ڕێساکانی بەرنامەی ئیسلام بۆ بەڵگەهێنانەوە بوونی سەری حوسێن لە قاهیرە دەبەستنەوە بە هەبوونی پێشوەختی ئەو سەرە لە عەسقەلان، پێش کەمێکیش

---

١ المقریز (٤٢٧/١)، بدائع الزهور (٢٢٧/١).

٢ تأریخ میافارقین (ص: ٧٠).

٣ نور البصائر (ص: ١٢١)، مشاهد الصفا (ص: ٣١٦)، مواقف المعارضة (ص: ٣١٦).

٤ مواقف المعارضة (ص: ٣١٧).

٥ الحسین سید شباب أهل الجنة (ص: ١٤٩-١٥٣).

ناڕاستی بوونی سەرەکەمان لە عەسقەلان سەلماند، کەواتە ئەو سەرەی بۆ قاهیرە براوەو، لەو شوێنەدا نێژراوە کە ئیمڕۆ بە مەشهەدی حوسێنی ناسراوە درۆو دەلەسەیەو، هیچ پەیوەندیەکی بە سەری حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت)ەوە نیە، ئەم قسەیەمان دوای ئەوەیە کە سەلمێنرا ئەو سەرەی لە عەسقەلان نێژرابوو لە ڕاستیدا سەری حوسێن نەبووە، ئەی کەواتە کەیو لە چ کاتێکدا وتراوە سەری حوسێن لە عەسقەلانەو، ئەو سەرە بۆ کەی دەگەڕێتەوە؟ (النویري) دەڵێ: لە سەردەمی (المستنصر بالله)ی عەبیدی دەسەڵاتداری مصرو وەزارەتی بدر الجمالي پیاوێك -کە خەڵکی عەسقەلان بوو- لە خەونیدا پێی نیشان درا کە سەری حوسێن لە شوێنێکی ئەو شارەیەو، لە خەونەکەیدا شوێنەکەیان بۆ دیاری کرد، ئەمەو ئەو شوێنەیان هەڵدایەوەو (بدر الجمالي)ی وەزیری فاطمی لە شوێنی خۆیداو لە عەسقەلان -پاش ناشتنی سەرەکە- (گومبەز) یان مەشهەدێکی بەسەر گۆڕەکەوە دروست کرد.[1] دوای ئەمە (الأفضل) دەری هێنایەوەو بۆنخۆشی کردو لە شوێنێکی تری عەسقەلاندا ناشتیو مەشهەدێکی زۆر گەورەی بە سەرەوە دروست کرد.[2] لەوانەیە تۆ لە بەرانبەر پەلەپەلی عەبیدیەکان بۆ دروستکردنی گومبەز لەسەر ئەو سەرە هەر بە خاتری خەونبینینی پیاوێكو بەس سەرت بسوڕمێ! بەڵام ئەگەر مێژووی ئەوانت زانی ئەمەت زۆر بە لاوە نامۆ نابێت، هەڵبەتە هەستکردنیان بەوە کە خەڵك باوەڕیان پێ ناکەن ڕەچەڵەکیان بچێتەوە سەر (حوسەین)، وای لێ کردوون شتێك بکەن پەردەپۆشی ئەمە بکاتو بە داهێنانی بابەتی بوونی سەری حوسێن لە عەسقەلانو خۆنیشاندان بەوە کە بایەخی پێ دەدەنو گومبەزو مەشهەدی بە سەرەوە دەکەنو پارەو سامانی زۆرو زەوەند لە ڕازاندنەوەی خەرج دەکەن، بەڵێ بەمە ویستوویانە وا لە خەڵك بکەن باوەڕیان پێ بکەن کە سەیدزادەنو نەوەی (حوسەین)نو بێنە قەناعەتو بڵێن: ئەگەر ئەمانە نەوەی خۆی نەبوونایە بەم جۆرە بایەخیان پێ نەدەدا!، ئەمجا لێرەدا داهێنانی بوونی سەری حوسێن لە عەسقەلانداو ئیددیعاکردنیان بۆ بوونی ئەو سەرە لەو شارەدا جیا لە هەموو ئەو شوێنو ناوچانەی تری ژێر دەسەڵاتیان ڕەهەندێکی تری سیاسی هەبوو، کە بریتی بوو لالە ڕووبەڕووبوونەوەو کێبەرکێ کردنی ئەو دەوڵەتە سوننیانەی لە وڵاتی شامدا حوکمیان دەگێڕا، وەك زانراوە حکومەتەکەی (المنتصر بالله)ی عەبیدی هاوزەمان بووە لەگەڵ دەوڵەتی سلجوقی سوننی، کە لە ساڵی ٤٤٧ی کۆچیداو بە سەرکردایەتی توغڕوڵبەگی سەرۆکی توانی دەست بەسەر بەغدادا بگرێ.[3]

---

١ نهاية الأرب (٢٠/٤٧٨).

٢ إتعاظ الحنفاء للمقريزي (٣/٢٢).

٣ النجوم الزاهرة (٥/٥٧).

یەکێکی تر لەو ڕاستیانەی دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەوە کە داهێنانی بوونی سەری حوسێن لە عەسقەلان‌و گواستنەوەی بۆ مصر بە تەنها نەخشەیەکی عەبیدیەکانەو بەس، ئەوەیە کە لە هیچ کامێك لەو کتێبانەی بەر لە خیلافەتی مونتەصیری فاطمی نوسراون باس‌و خواسی بوونی سەری حوسێن لە عەسقەلانیان تێدا نەهاتووە، بێگومان ئەم بەڵگەیە درۆی عەبیدیەکان گەورەو زەقتر دەکاتو، دەری دەخات کە مەبەستیان لە داهێنانی ئەم بابەتەدا تەنهاوتەنها بریتی بووە لە بەدیهێنانی کۆمەڵێك بەرژەوەندی‌و پێکانی ئامانجە تایبەتیەکانی خۆیان،[1] إبن تيمية دەڵێ: ئەم سەرەی کە بە گومان‌و خەیاڵ دەڵێن هی حوسێنە، هی ئەو نیە، بەڵکو لە ئەسڵدا سەری قەشەیەکەو بەس.[2] إبن دحية لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا (العلم المشهور)دا کۆڕا (إجماع)ی زانایانی لە درۆو دەلەسەی بوونی سەری حوسێن لە عەسقەلان‌و قاهیرە هێناوە، هەروەها یەکدەنگی زانایانی لەسەر درۆو دەلەسەی ئەو مەشهەدە حوسەینیە هێناوە کە لە قاهیرەیەو دەڵێ ئەمە لە دانانی عەبیدیەکانەو ئەوان بۆ بەدەستهێنانی چەند مەرامێکی خراپ ئەم مەشهەدەیان دروست کرد، بەڵام خوا ئەم دەوڵەتەی لەنێو بردو بە پێچەوانەی ئەوان‌و مەبەستەکانیان شتێکی تری هێنایە ئاراوە.[3] هەر یەکێك لەم زانایانەش: إبن دقيق العبيدو، أبومحمد کوڕی خلف الدمياطي‌و، أبو محمدی قەستەلانی‌و، أبو عبدالله‌ی قورطوبی‌و ژمارەیەکی تریش، ئینکاری بوونی سەر-ی حوسێن-دەکەن لە مصر،[4] إبن کثير دەڵێ: ئەو تایەفەی بە فاطیمیەکان ناویان دەرکرد بەر لە ٤٠٠ تا ساڵی ٥٦٠ی کۆچی حوکمڕانی میصریان کرد، پڕوپاگەندەی بە دونیادا بڵاوکردەوە کە سەری حوسەین گەیەنرایە وڵاتی میصرو لەوێدا ناشتوویانە، ئەمەو دوای ساڵی ٥٠٠ی کۆچی ئەو مەشهەدە مەشهورەیان بە سەرەوە دروست کرد کە دوایی پێی دەوترا تاجی حوسێن، زانایانێکی زۆر قسەیان لەسەر کردووە، کە ئەمە هیچ بنەمایەکی نیەو، تەنها بەمە ویستوویانە ڕەواج بەو ناهەقیەی خۆیان بدەن کە دەیانوت سەییدین‌و دەچینەوە سەر ڕەچەڵەکی شەریف(ی فاطمة)، ئەمان لەم ڕووەوە درۆزن‌و ناپاك دەرچوون، قازی باقلانی‌و زاناگەلێکی تریش قسەیان دەربارەی نێوەڕۆکی دەوڵەتی فاطمی کردووە.

---

١ مواقف المعارضة (ص: ٣١٩).

٢ رأس الحسين (ص: ١٨٧)، نقلا مواقف المعارضة (ص: ٣٢٠).

٣ رأس الحسين (ص: ١٨٧)، نقلا مواقف المعارضة (ص: ٣٢٠).

٤ رأس الحسين (ص: ١٨٦، ١٨٧).

من دەڵێم: ئێستا زۆرینـەی خـەڵك ڕەواج بـەم پڕوپاگەنـدەی ئـەوان دەدا، ئـەوان هـاتن‌و کەللەسەرێکیان لەگەڵ خۆیان هێناو لە شوێنێکی ئەم مزگەوتەیان داناو وتیان: ئەمـە سـەری حوسێنە، جا خەڵك ڕەواجیان بۆ پێدان‌و هاتنەسـەر ئـەو بـاوەڕە –کـە ئەمـە گـۆڕی سـەری حوسێنە– والله أعلم.[1]

٦ـ مەدینەی نەبەوی:

بە لای ئێمەوە بچووکترین بەڵگەش دەسـت ناکـەوێ بیسـەلمێنێ کـە سـەری حوسـێن لـە یەکێك لەو شارانەیە کە بەر لە ئێستا باسمان لێـوە کردن، جگـە لـە شـاری (مەدینـە) هـیچ شوێنێکی ترمان لە پێش نەماوە، إبن سعد بە ئیسنادێکی جـەمعی ڕیوایـەت دەکـات‌و دەڵـێ: یەزید سەرەکەی بۆ لای عەمڕوی کوڕی سەعیدی والی مەدینە ڕەوان کرد، ئەویش کفنی کـردو لە بەقیع‌و لە پەنا گۆڕی دایکی (فاطمة)ی کچی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ناشتی.[2]

إبن تیمیة دەڵێ: نێژرانی لە بەقیع ئا ئەو ڕاستیەیە کە دابونەریتی خەڵکی ئـەو سـەردەمە شایەدی بۆ دەدات، ئەگەر لـە کـاتی ئاشـوب‌و جەنگدا یـەکێك لـە خۆیـان یـان لـە خـەڵکانی بێگانـەش بووایـە لـەو نێـوەدا بکوژرابایـە، سـەرو جەسـتەیان ڕادەسـتی کەسـوکارەکەی دەکردەوە، وەکو چۆن حـەجاج دوای ئـەوە عبـدالله ی کـوڕی زوبێـری کوشـت‌و هەڵیواسـی، یەکسەر ڕادەستی کەسوکارەکەی کردەوە، خـۆ زانـراوە ئـەو هـەوڵ‌و تەقالایـەی حـەجاج بـۆ کوشتنی ئیبنو زوبێر دای‌و ئەو جەنگ‌و پێکدادانانە سەربازیانەی لەنێوان ئەم دوانـە ڕوویانـدا زۆر گەورەتر بوون لەو شتانەی کە لە نێوان حوسێن‌و ناحەزەکانیدا ڕوویاندا.[3] هەروەك چـۆن ئێمە یەك ڕەخنە یان ناڕەزاییەکمان نایەتە بەرچاو کە لە لایەن ئالوبەیت، یـان هـاوەڵان یـان شوێنکەوتووان سەبارەت بە مامەڵەی یەزید لـە بەرانبـەر سـەری حوسـێندا ئاڕاسـتەی یەزیـد کرابێ. بە بیروبڕوای مـن ئەگـەر یەزیـد ئـەو جـۆرە هەڵسوکەوتەی لەگـەڵ سـەری حوسـێندا کردبایـە کـە هەنـدێك لـە ڕیوایەتـەکان دەڵـێن گوایـە شارەوشـار گێڕاویـەتی‌و سـوکایەتی پێکردووە، ئەوا بە دڵنیاییەوە هاوەڵان‌و شوێنکەوتووان هەڵوێستێکی تریان لە بەرانبـەر ئـەم کردارەی (یەزید)دا دەبوو و، لە جەنگی (حرة)شدا هیچ کامێك لە گـەورە هـاوەڵان دەرچـوون لە دژی ئەویان ڕەفز نەدەکردو، دەمانبینین کە دەچوونە پاڵ عبدالله ی کوڕی زوبێری گەورە

---

١ البداية والنهاية (١١/٥٨٢).

٢ الطبقات (٥/٢٣٨)، تأريخ الاسلام (ص: ٢٠)، حوادث (٦٠ـ٨١هـ).

٣ رأس الحسين (ص: ١٨٣).

بەرهەڵستیکاری یەزید.[١] ئەم قسەیەی (حافظ أبو یعلی الهمداني) بەم جۆرە پشتگیری ئەم رایە دەكات: سەر-ی حوسێن- لە تەنیشت فاطمة (ڕەزای خوایان لێ بێت) نێژرا، ئەمە ڕاست‌و دروستترین قسەیە کە لەم بارەوە وترابێ.[٢] زانایانی بواری ڕەچەڵەكناسی وەك زوبێری كوڕی بكارو محمدی كوڕی حەسەنی مەخزومی‌و غەیری وانیش هەمان بیروڕایان هەیە.[٣] (إبن أبي المعالي أسعدی كوڕی عمار) لە كتێبی ((الفاصل بين الصدق والمين في مقر رأس الحسين))دا دەڵێ: كۆمەڵێك لە زانایانی جێ متمانەی وەك (إبن أبي الدنيا وأبو المؤيد الخوارزمي وأبو الفرج إبن الجوزي) تەئكیدیان لەسەر ئەوە كردووە كە سەری حوسێن لە بەقیعی مەدینە نێژراوە.[٤] (القرطبي)ش بە دوای ئەواندا هاتووەو هەمان ڕای ئەوانی هەیە،[٥] الزرقاني دەڵێ: (إبن دحية) وتی بێ لە ئەمە هیچ شتێكی تر ڕاست نیە.[٦]

(إبن تيمية)ش ئەو لایە دەگرێ كە یەزید سەری حوسێنی بۆ لای عمری كوڕی سعیدی والی مەدینە ڕەوانە كردبێ‌و داوای لێ كردبێ لە تەنیشت گوڕی فاطمەی دایكی (ڕەزای خوایان لێ بێت) بینێژێت، ئەو هۆكارەی إبن تیمیەی وا لێكردبێ ئەم ڕایە دەربڕێ ئەوەیە: ئەو كەسانەی وتوویانە سەری حوسێن بۆ مەدینە گوازراوەتەوە لە ڕیزی ئەو زاناو مێژوونووسانەن كە باوەڕپێكراون‌و پشتیان پێ دەبەسترێ، وەك: زوبێری كوڕی بەكاری خاوەنی (كتاب الانساب)و (محمد بن سعد كاتب الواقدي)ی خاوەنی (الطبقات)و چەندین زانای تریش كە بە صیفەتەكانی زانست‌و متمانەو هۆشیاری‌و خوێندەواری ناویان دەركردوەو، ئەوان لەم بوارەدا لە هەموو ئەو نەفام‌و درۆزنانە ڕاستگۆترن كە هەواڵیان لێ وەردەگیرێت‌و لەو چەند مێژوونووسەش شارەزاترن كە هیچ متمانەیان پێ ناكرێ، جار دەبێ كابرا ڕاستگۆیە، بەڵام سەبارەت بە سەنەدی ڕیوایەتەكان هێندەی شارەزایی پێ نیبە تا بتوانێ هەواڵە پەسندەكان لە ناپەسندەكان جیا بكاتەوە، یان بۆی هەیە لایەنی لاوازو خراپ بێ، یان بە درۆو تەزویركردن ڕیوایەتەكان تۆمەتبار بێ، وەك حاڵی زۆرێك لە حیكایەتخوان‌و مێژوونووسەكان ئاوایە.[٧]

---

١ مواقف المعارضة (ص: ٣٢٣).

٢ التذكرة للقرطبي (٢/٢٩٥).

٣ التذكرة (٢/٢٩٥).

٤ الرد على المتعصب العنيد، نقلا عن مواقف المعارضة (ص: ٣٢٣).

٥ التذكرة (٢/٢٩٥)، مواقف المعارضة (ص: ٣٢٤).

٦ مشاهد الصفا ورقة (١٠)، نقلا عن مواقف المعارضة (ص: ٣٢٤).

٧ رأس الحسين (ص: ١٧٠).

أبو عمر عبدالله ی کوڕی محمد الحمادی دەڵێ:

دەربارەی شوێنی سەری حوسێن جیاوازییان تێکەوتووە بۆ سەر سێ شوێن، هەر کامێك لەو سێ تاقمە دەڵێ سەری حوسێن لە لای منە، دیارە بە نیازی ئەوە زۆر سەردانی مەزارگایەکەی وڵاتی ئەو بکرێتو پارەی زۆرو زەوەند هەڵبدرێتە نێویەوەو، بەمەش سەرپەرشتیارو مجێورو پاسەوانەکانی ئەو گۆڕە بەسەر خۆیانیدا دابەش بکەن، جا بەم ڕاجیاییەیان سێ سەریان بۆ حوسێن داناون، بە دڵنیایشەوە دەزانین کە حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) تەنها یەك سەری هەبووە.[١] لە میانەی ئەم توێژینەوەیەدا دەرکەوت کە جەستەی حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) لە کەربەلایەو، سەرەکەشی لە بەقیعی مەدینەیە، والله أعلم.

## سێهەم: شیعەو بە پیرۆزدانانی مەرقەدی ئیمامەکانو سەردانی گۆڕی حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت):

شیعەکان زیادەڕەوی زۆریان لە بە گەورەدانانی مەرقەدی ئیمامەکاندا کردووە، بە ئەندازەیەك پیرۆزییان پێ بەخشیون، کە کابەی پیرۆزو مەدینەی مونەوەرە قەت هێندەیان بەر نەکەوتووە، بە درۆو بوختان ئەم قسەیان پاڵداوەتە لای عەلی کوڕی حوسێن، کە گوایە وتوویەتی: خوای گەورە (٢٤) هەزار ساڵ بەر لەوە خاکی کابە دروست بکاتو بیکا بە حەرەمو بە فەڕو پیرۆزی بکات، خاکی کەربەلای دروست کردو کردی بە حەرەمێکی هێمنو موبارەك، جا بەر لەوە خودا دروست کراوەکان دروست بکات بە موبارەکیو موقەدەسی مایەوە، ئیتر بەردەوام لە پیرۆزیو بە فەڕیدا نوێ دەبێتەوە تا ئەو کاتە خودا دەیکا بە باشترین خاکی بەهەشتو باشترین تەلارگاو ماڵی وا کە دۆستە بەهەشتیەکانی تێدا نیشتەجێ دەکرێن.[٢]

هەروەك چۆن ئەم وتەیەشیان پاڵداوەتە لای جەعفەری صادقەوە، کە بێگومان ئەو لێی بەرییە، گوایە وتوویەتی: خاکی کابە وتی: وێنەی من کوا هەیە، ماڵی خودا لەسەر پشتم دروست کراوە، خەڵك لە هەموو ڕێگایەکی فراوانو قووڵو بەرزاییو نشێوێکی دوورەوە سەردانم دەکەن، کراوم بە حەرەمو ئاسایشگا، جا خودا وەحی بۆ کرد: واز بێنەو دامرکێ، ئەو پیرۆزیو موبارەکیەی بە تۆم داوە لە بەرانبەر ئەو فەڕو پیرۆزیەی بە خاکی کەربەلام

---

١ شرح الصدور ببيان بدع الجنائز والقبور (ص: ١٤٧).

٢ بحار الأنوار (١٠١/١٠٧)، أصول مذهب الشيعة.

داوە تەنها وەك ئەو دڵۆپە ئاوەیە لە بەرانبەر ئاوی دەریادا کە دەرزیەك دوای نقوم کردنی لە دەریادا لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێتە دەرەوە، ئەگەر گڵی کەربەلا نەبوایە قەت هەڵم نەدەبژاردی، ئەگەر خاکی کەربەلا ئەو شتەی لە باوەشی خۆی نەگرتبایە هەرگیز دروستم نەدەکردی، ئەو ماڵەشم دروست نەدەکرد کە تۆ شانازی پێوە دەکەی، کەواتە ئارام بگرەو داسنەکێو، لە بەرانبەر خاکی کەربەلادا گەردنکەچو داماوو خۆ بە کەمگر بە دەنا لە جێگای خۆت ڕۆت دەچوێنمو هەڵت دەدەمە نێو ئاگری دۆزەخەوە.[1] لە ڕاستیدا بە گوێرەی بیروباوەڕی ئەوان ئەم پارچە زەویە تەنها بە هۆی ئەوە حوسێنی لە خۆدا شاردۆتەوە ئەم پلەو پایەی پێ دراوەو بەس، هەر لە دوای ئەو ڕووداوە تا بە ئیمڕۆ دەگات لەسەر زمانی شاعیرانو قەڵەمی نووسەران دەستکراوە بە بەراوردکردنی ئەو شوێنە لەگەڵ کابەی پیرۆزو بە چەندین شێوازی شیعرو پەخشان هونەرمەندی خۆیان نواندووەو ویستوویانە بیسەلمێنن کە ئەم خاکە پیرۆزو پایەبەرزو بەخێروبێرەو، بەسەر تەواوی پارچەکانی تری زەویدا هەڵبژێردراوە، هەروەها ئەم خاکە پیرۆزە لە ئیسلامدا تەنها بەهۆی حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەم پلەوپایە مەزنەی پێدراوە، بە گوێرەی دەقی ئەم بەناو حەدیسە: ((وزادها في تواضعها وشكرها لله بالحسين عليه السلام وأصحابه))[2] واتە: خودا بە هۆی حوسێنو هاوەڵەکانیەوە خۆبەکەمزانینو شوکرانەبژێری زیاتری پێ بەخشی.

لەسەر بنەمای بیروباوەڕو زیادەڕەویان لە ئیمامەکاندا، -کە لە کتێبی (أمير المؤمنين) (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەم لایەنەم زیاتر ڕوون کردۆتەوە-، لە پێناو بەستنی پەیوەندی لە نێوان خەڵكو مەرقەدو مەشهەدەکانیان، حەدیسی زۆریان لەسەر پاداشتی زۆرو خەڵاتی گەورە داناون کە بەو کەسانە دەبەخشرێن سەردانیان دەکەن، لەبەر زۆروزەوەندی ئەو دەقانەی لەم بارەوە هاتوونو جیاوازی گەورە دەخەنە نێوان زیارەتکارانی ئەو مەرقەدانەو زیارەتکارانی ماڵی خودا بە مەبەستی حەجو عومرە،[3] من لێرەدا تەنها دوو دەق دێنم چونکە زۆربەی نێوەڕۆکی دەقەکانی تریان لەخۆگرتووەو دەیخەمەڕوو کە چەندە درۆزنو بوختانکەرنو چۆناوچۆن گاڵتە بە ئاوەزی شوێنکەوتوانیان دەکەنو لە ترسی خوای بەرزو مەزن وێراویانە حەدیس بە دەم (أبو عبدالله ی جعفری صادق)ەوە هەڵبەستن، کە گوایە

---

١ كامل الزيارات (ص: ٢٧٠)، بحار الأنوار (١٠١/١٠٩)، أصول مذهب الشيعة (٢/٤٦٤).

٢ أصول مذهب الشيعة (٢/٤٦٤).

٣ تأريخ الكربلاء (ص: ١٠٢)، القبورية في اليمن (ص: ١٥٥).

وتوویەتی: ئەگەر خەڵك دەیانزانی زیارەتی حوسێن (علیە السلام) چ پاداشتێکی گەورەی لەسەرە ئەوا لە خۆشیان دەمردن‌و لە حەسرەتان هەناسەیان ڕادەوەستا، ڕاوی دەڵێ: وتم: چ پاداشتێکی لەخۆگرتووە؟ وتی: هەر کەسێك بە حەزەوە زیارەتی بکات خودا خێری هەزار حەجی قبوڵ بوو و هەزار عومرەی وەرگیراو، پاداشتی هەزار شەهید لە جۆری شەهیدانی بەدرو، مزەی هەزار ڕۆژووگرو، ئەوابی هەزار صەدەقەی قبوڵکراوو، پاداشتی هەزار نوسخە قورئان کە لەبەر خاتری خودا نوسرابنەوەی بۆ دەنوسرێت، لەو ساڵەدا بە بەردەوامی لە هەموو بەڵاو نەهامەتیەك دەپارێزێت کە هەرە سوکەکەیان شەیتانە، فریشتەیەکی بەڕێزی بۆ تەرخان دەکرێ‌و لە پێشەوەو لە پاشەوەو لە ڕاست‌و چەپو لە سەرەوەو ژێر قاچیەوە دەیپارێزێت‌و پاسەوانی لێ دەکات، ئەگەر لەو ساڵەیدا بمرێ، فریشتەکانی خودای ڕەحمان هەم لە کاتی گیانکێشانیدا هەم لە کاتی شۆرین‌و کفنکردن‌و پاڕانەوە بۆی ئامادە دەبن‌و، بە دەم نزای هاوارە خوایە لێی خۆشبە دەیخەنە نێو گۆڕەکەیەوە، ئەوەندەی چاوی بڕ بکات گۆڕەکەی بۆ فراوان دەکرێ‌و، خودا لە گوشین‌و وێکهاتنەوەی نێو گۆڕو تۆقاندنی نەکیرو مونکەر دەیپارێزێ، دەرگایەکی لە بەهەشتەوە بۆ دەکرێتەوەو، نامەی کردەوەکانی بە دەستەڕاستەی پێ دەدرێ‌و، ڕۆژی قیامەت چرایەکی پێ دەدرێ کە تروسکاییەکەی نێوانی خۆرهەڵات‌و خۆرئاوا ڕووناك دەکاتەوەو، جارچییەك بانگ دەکات: ئا ئەو کەسە یەکێکە لەو زیارەتکارانەی کە بە شەوق‌و زەوقەوە زیارەتی حوسێنیان دەکرد، یەك کەس لە ڕۆژی قیامەتدا نامێنێ ئیللا ئاوات هەڵدەخوازێت ئەویش لە ڕیزی زیارەتکارانی حوسێن (علیە السلام) بووایە.[1] یەکێك لە زاناکانیان بە جائیزی دادەنێ ئەم زیادەڕەویانە دەربارەی ئیمامەکان بکرێ‌و، باسی گەورەیی‌و پایەدارییان بکرێت‌و هەموو ئەو صیفەتانەیان بخرێنەڕوو کە لە ژوور ئاستی ئینسانی بووندا پێیان بەخشراون‌و، دەڵێ: ئەمە بە نیسبەت کەسێکەوە کە خودای دروستکەری ئاسمان‌و زەمینەکان کردبێتی بە ئیمامی ئیمانداران‌و ئەو ڕێبازو چاوساغ‌و بەڵگەو دەروازەیەی کە چوونەژوورەوەی تێدایەو، کردبێتی بە گەیەنەری نێوان خۆی‌و بەندەکانی لە پێغەمبەران‌و حوجەت‌و دۆستەکانی، هیچ زۆر نیەو زیادەڕەوی تێدا نیە، ئەمە لەگەڵ ئەوەدا کە گۆڕەکانیان بەخشینی سامان‌و گەیشتن بە مرادو ئاوات‌و ماندوو مجرۆبوونی جەستەو بەجێهێشتنی نیشتمان‌و هەڵگرتنی کۆڵی گرانی سەفەرو، نوێکردنەوەی

---

١ وسائل الشيعة (٣٥٣/١)، بواسطة أصول مذهب الشيعة (٤٥٦/٢).

پەیمانو بینینی دروشمەکانو ئامادەبوونی هەستو نەستەکانو هەموو ئەوانەیان لەخۆدا گرتووە.[1]

لە ئەنجامی زیادەڕەوییان لە بە پیرۆزدانانی ئەم گۆڕانەیاندا وای لێکردوون پەرستن (مناسك)ی تایبەتیان بۆ دابنێن، هەڵبەتە ئەم چەشنە پەرستنانە بە تەنها تایبەت نەکراون بە گۆڕی حوسێنەوە، بەڵکو پەیوەندییان بە گۆڕی هەموو ئیمامەکانیانەوە هەیە.[2] یەکێك لە ئاخوندەکانیان بە ناوی ئاغابوزورگی تارانی دەڵێ: ئەو نوسراوانەی ئاخوندەکان دەربارەی زیارەتگاو پەرستنەکانی تایبەت بەو مەزارانە دایانناون ژمارەیان گەیشتۆتە شەست کتێب.[3] هەر بە کورتی یەکێك لەو پەرستنانەی کە لە کاتی سەردانی مەشهەدەکانیاندا ئەنجامیان دەدەن دەخەینەڕوو، (الصادق علیه السلام) وتی: ئەگەر ویستت بەرەو لای گۆڕی حوسێن (علیه السلام) بەڕێ بکەوی، ڕۆژانی چوارشەممەو پێنج شەممەو جومعە بەڕۆژوو بە، ئەگەر ویستت لە ماڵ دەربچی خێزانو ڕۆڵەکانت کۆبکەوەو دوعای سەفەر بخوێنە، بەر لە ڕۆیشتنت خۆت بشۆ، لە کاتی خۆشۆریندا ئەمەو ئەمە بڵێ، ئەگەر دەرچووی ئەمەوئەمە بڵێ، هەتا دەگەیە فورات قژت چەور مەکەو چاوت مەڕێژە، لە قسەو گاڵتەوگەپ کەم بکەوە، زیکری خوا زۆر بکە، خۆت لە سوعبەتو دمبەدمە دوور بخەوە، جا ئەگەر سوار یان پیادە بووی ئەمە بڵێ.. ئەگەر لە شتێك ترسای ئەمە بڵێ.. کە گەیشتیە فورات بەر لەوە لێی بپەڕیەوە بڵێ.. ئەمجا بپەڕەوە.. ئەمجا بە درێژی هەتا دەڵێ: ئەم پەرستنانە ئەنجام بدە:... ئەمجا ڕومەتت لەسەر گۆڕ ((گۆڕی حوسێنی کوڕی عەلی)) دابنێو بڵێ: ... ئەمجا لە پشت حوسێن (علیه السلام)ەوە پێچ بکەوەو بۆ لای سەری بچۆو دوو ڕکات نوێژ بکە.. ئەمجا سەر بەسەر گۆڕەکەدا شۆڕبکەوەو بڵێ: ... ئەمجا لە ژێر چەترەکە دەربچۆو لە بەرانبەر گۆڕی شەهیدەکان ڕابوەستەو بەسەرت ئاماژە بۆ تێکڕایان بکە.[4] ئەمەو هەتا دەگات بە ئەنجامدانی چەندین شتی تری لەم تەرزە پەرستنانە لە کاتی سەردانکردنی ئەم مەشهەدانە لە سوڕانەوە (طواف) بە دەوریانداو ڕووتێکردنیان لە کاتی نوێژکردنیانداو چەندین شتی تر کە ویستم هەروا بە کورتی بیخەمەڕوو،[5] دەتوانی هەندێکیان لە کتێبی (أصول مذهب

---

١ قسەی فیض الکاشاني (٢/٢٥٤)، القبوریة في الیمن (ص: ١٥٦).

٢ القبوریة في الیمن (ص: ١٥٧).

٣ الذریعة إلی تصانیف الشیعة، نقلا عن أصول مذهب الشیعة (٢/٤٦٧).

٤ تأریخ کربلاء (ص/ ١٢٩، ١٣١)، القبوریة في الیمن (ص: ١٥٨).

٥ القبوریة في الیمن (ص: ١٥٨).

الشیعة)دا تەماشا بکەی.[١] ئەوە هیچ کە بە گوێرەی بیروباوەڕی شیعە دروستکردنی گومبەز لەسەر مەرقەدی پێغەمبەرانو ئیمامەکان–و کەسایەتیە ئیسلامیەکان– گەورەترین کردارە بۆ خۆ نزیککردنەوە لە خودای پاكو بەرز، ئێستا فەرموو جەنابتو بەرپەرچدانەوەی هەر یەکێك لە:

١– پیرۆزی کەربەلا:

هیچ دەقێك نە لە قورئانی پیرۆزدا دەست دەکەوێو، نە لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بە ڕاست گەڕاوەو، نە لە خەلیفە سەرڕاستەکان یان زانایانی ئوممەتی باشترین سەدەکان چەسپاوە، تا ببێتە بەڵگە بۆ پیرۆزبوونی کەربەلاو هەموو ئەو خێرو بەرەکەتە خەیاڵپلاوانەی ئەوێو نەجەفو ئەو شوێنانەی پێیان دەڵێن (عەتەباتی موقەدەسە). بەڵکو ئەوەی لە قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەری خودا (ﷺ)دا هاتووەو دەبێتە بەڵگەی بە پیرۆزدانانو ڕێزدانانی چەندشوێنێك ئا ئەمانەن: مزگەوتی حەرام، دروشمە پیرۆزەکانی نێو مزگەوتی حەرام و دەرەوەی، وەك: کابە، مەقامی ئیبراهیم، بیری زمزم، صەفاو مەڕوە، مینا، خاکی عەرەفات، خاکی موزدەلیفە، مزگەوتی پێغەمبەرو خێری نوێژکردن لەنێویداو، گەورەیی نێوان ماڵی پێغەمبەرو مینبەرەکەی (ڕەوزە)و، جائیزبوونی سەفەر بۆ ئەوێو، مزگەوتی حەرامو مزگەوتی ئەقصاو، گەورەیی مەدینەو مزگەوتی قوباو، نزای پێغەمبەر (ﷺ) بۆ موبارەکبوونی مەدینە، بوونی فەڕو بەرەکەت لە جامی پێوانەو کێشانەی خەڵکی مەدینە بۆ هەتاهەتایە، بە حەرەمکرانی مەدینە لە لایەن پێغەمبەری خودا (ﷺ)ەوەو حەرامکردنی ڕاوکردنو بڕینی دارو درەخت تێیدا، گەورەییو پیرۆزی دۆڵی عەقیقو، گەورەیی بەرەکاتی مزگەوتی ئەقصاو خێری نوێژکردن لەنێویداو جائیزبوونی سەفەرکردن بۆ ئەوێو هەبوونی بەرەکەت لە دەوروبەرییو، دووەم مزگەوتە کە لە دوای مزگەوتی حەرامەوە دروست کراوە، شەوڕەوی پێغەمبەری خودا (ﷺ) بۆ ئەو مزگەوتە، هەروەها چەندین ئایەتو حەدیس لەسەر گەورەییو پیرۆزی تەواوی مزگەوتو ماڵەکانی خودای گەورەو مەزن هاتوون، پێغەمبەری خودا (ﷺ) ڕوونی کردۆتەوە کە مزگەوتەکان ماڵانی خودان لەسەر زەویداو، خێرو پاداشتی گەورە لەسەر چوونە مزگەوتەکانەوەو پابەندبوون پێیانەوەو خێرو پاداشتی زۆر لەسەر دروستکردنیانو ئاوەدانکردنەوەیان هەیە[٢].... هتد. بەلام هەر حەدیسێك

---

١ أصول مذهب الشيعة (٢/٤٦٧، ٤٧٧).

٢ من قتل الحسين (ص: ١١٣).

سەبارەت بە قودسییەتی کەربەلاو بە گەورەدانانی درابێتە پاڵ پێغەمبەری خودا (ﷺ) فرێ بەسەر ڕاستیەوە نیە، ئیتر ئەم حوکمە دەچەسپێت بەسەر هەموو ئەو شارو مەشهەدو گۆڕو گۆڕستان‌و مەزارانەی لە لایەن شیعەکان یان نەفامانی سوننە مەزەب بە پیرۆزو گەورە دانراون‌و دادەنرێن.

٢ـ ڕێنمایی ئیسلام بۆ زیارەتی گۆڕستان:

هەروەك چۆن دەبینین تەواوی بڕیارەکانی شەریعەتی ئیسلام لەوپەڕی تێرو تەواوی‌و هاوسەنگی‌و فراوانی دان‌و، جۆگەلەیان لە کانیاوێکی پڕ حیکمەتەوە بەستووە، بە چەشنێك هەر کەسێك لە ژێر ڕۆشنایی ئەو بڕیارانەوە بڕوات بەبێ ئەوەی ڕووبەڕووی هیچ هۆکارێك لە هۆکارەکانی گومڕایی‌و بەدشانسی دونیاو دوارۆژ ببێتەوە، سەرکەوتن‌و بەختەوەری هەردووك دونیای بۆ مسۆگەر دەبێ، بە هەمان شێوە بڕیاری شەرع بۆ سەردانی گۆڕەکان مەشخەڵێك بوو بۆ موسڵمانان، سەرەتا لە ئیسلامداو لەو دەمەدا کە خەڵك تازە هاتبوونە نێو ئیسلامەوەو، هێندە نەبوو بەرەی کوفرو شیرك‌و پەرستنی غەیری خودایان بەجێ هێشتبوو، پێغەمبەری خودا (ﷺ) بڕیاری قەدەغەکردنی چوونە سەر گۆڕستانی بۆ دەرکردن، ئەمە لە پێناوی ئەوەدا تا بەرزەکێکی جیاکەرەوە لە نێوان هەردووك سەردەمی: شیرك‌و تەوحیدو، نەفامی‌و ئیسلامدا دابنێ‌و، –بە تێپەڕینی کات– هەموو ئەو شتانە لە دەروونیاندا ڕامالێ کە وایان لێ دەکات ئاوڕ بۆ هەموو ئەو جۆرە شتانە بدەنەوە کە خەڵك لەسەر زەویدا بە پیرۆزیان دادەنێن‌و، بە تەواوەتی لەو سەردەمە زێڕینەدا قاڵیان بکاتەوەو دڵ‌و دەروون‌و زەینیان هێندە صاف بکاتەوەو لایەنی ڕوحییان بە چەشنێك بەرز بکاتەوە کە دوایە بە هیچ شێوەیەك بێزیان نەیا ئاوڕ بۆ غەیری خودای عز وجل بدەنەوە.[1] لەگەڵ هاتنەدی ئەم ئامانجە، پێغەمبەر (ﷺ) ڕووی قسەی تێ کردن‌و فەرمووی: ((کنت نهیتکم عن زیارة القبور فزوروها[2] فإنها تذکر الموت)) واتە: پێشدا سەردانی گۆڕم لەسەر قەدەغە کردبوون، لەمەولا سەردانیان بکەن، چونکە مردن وەبیردەخاتەوە. لە ڕیوایەتێکی تردا فەرمووی: ((فإن في زیارتها تذکرة)) واتە: لە سەردانکردنیان بیرخستنەوە هەیە. بەپێی ڕیوایەتێکی دی: ((فإنها تذکر الآخرة))[3] واتە: چونکە ئەو قیامەت بەبیردەخاتەوە. لە سێیەمدا: ((فزوروها ولتزدکم

---

١ القبورية في اليمن (ص: ٧٣).

٢ مسلم، ك: الجنائز، شرح النووي على صحيح مسلم (٧/٤٦).

٣ شرح النووي على صحيح مسلم (٧/٤٦).

زیارتُها خیراً))[١] واتە: سەردانیان بکەن با زیارەتکردنیان خێرو چاکەتان بۆ زیاد بکەن. لە ڕیوایەتی چوارەمدا دەفەرمووێت: ((فإن فیها عبرة))[٢] واتە: پەندو ئامۆژگاری تێدایە. لەو حەدیسەدا کە أنس (ڕەزای خوای لێ بێت) ڕیوایەتی کردووە، دەفەرمووێت: ((ثم بدا لي أنها ترقُّ القلوب، وتُدمعُ العین وتُذکر الآخرة فزوروها))[٣] واتە: ئەمجار بۆم دەرکەوت کە سەردانکردنی گۆڕستان دڵ نەرم دەکاتو چاو بە گریان دێنێو، دوارۆژ بە یاد دەخاتەوە، کەواتە سەردانی بکەن. ئەمە هەموو بە نیسبەت زیارەتکارەوە، کە پێویستە لەسەری پێداگیری لەسەر ئەوە بکات کە بە هۆی سەردانەکەیەوە هەرچی خێرو پاداشتی زۆرترە بە دەستی بێنێ.[٤] بەڵام بە نیسبەت مردووەکانەوە، ئەوانیش بە هەمان شێوە بەشە خێریان لەم سەردانانەدا هەیە، وەك خاتو عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: هەر جارێك پێغەمبەری خودا (ﷺ) نۆبە شەوی ئەوی هەبووایە، لە کۆتایی شەودا بەرەو بەقیع دەچوو، دەیفەرموو: ((السلام علیکم دار قوم مؤمنین، وأتاکم ما توعدون غداً مؤجَّلون، وانا ان شاء الله بکم للاحقون، أللهم اغفر لأهل بقیع الغرقد))[٥] واتە: سەلامی خواتان لەسەر بێ، ئەی خەڵکی ئیمانداری ئەم گۆڕستانە، ئێستا لە مۆڵەتدانو لە سبەینەیەکی زوودا بەڵێنی ئەو پاداشتەتان پێ دەگات کە لە دونیادا پێتان درابوو، بە ویستی خودا ئێمەش بە ئێوە دەگەین، دەسا خودایە لە خەڵکی –مردووی– بەقیعی غەرقەد خۆش ببی. لەم فەرموودانەدا هۆکارو ئامانجەکانی زیارەتی گۆڕستان بە ڕوونو ئاشکرایی دەستنیشانکراون کە بریتین لە: سڵاوکردن لە مردووەکانو پاڕانەوە بۆیانو داواکردن لە خودای گەورە تا لێیان خۆش ببێ. ئیمامی صەنعانی لە (سبل السلام)داو لە دوای لێکدانەوەی هەموو ئەو فەرموودانەی پەیوەستن بە ڕێگەپێدان بۆ چوونە سەر گۆڕستان، دەڵێ: هەموو ئەمانە بەڵگەن بۆ ئەوە کە سەردانی گۆڕستان شەرعییەو، خودی شەرعاندنەکەش دەگێڕنەوە بۆ پەندوەرگرتن،... جا هەر کاتێك زیارەتی گۆڕستان ئەم حیکمەتەی تێدا نەبوو، شەرعی بوونەکەی نامێنێ.[٦]

---

١ سنن الترمذي (٣/٣٦١)، صححه الالباني في صحیحه (١/٣٠٧).
٢ مسند أحمد (١٧/٢٤٩)، صحیح، مؤسسة الرسالة
٣ البیهقي في شعب الایمان (٧/١٥)، رقم (٩٢٨٩)، کنز العمال (٤٢٥٥٥).
٤ شرح النووي علی صحیح مسلم (٧/٧٤).
٥ مسلم، بشرح النووي (٧/٤٠، ٤١)، کتاب الجنائز.
٦ سبل السلام شرح بلوغ المرام (٢/٢٣٠، ٢٣١).

ئەمەی ڕابووری بریتی بوو لە ڕێنمایی ئیسلام بۆ چۆنیەتی چوونە سەر گۆڕستانو، پێغەمبەری خودا (ﷺ) هاوەڵانی خۆی فێرکرد کە بەم شێوازە ئەنجامی بدەن، جا هەر کەسێك بە گوێرەی ئەم سوننەتو ڕێو ڕەسمە بچێتە گۆڕستانو ئەو ئامانجو مەبەستە ڕەچاو بکات کە لە پێناویدا دانراوە، بێگومان لە کۆتاییدا دەستی لەو خێرو پاداشتەش گیر دەبێ کە بۆی تەرخان کراوە، بەڵام کەسێك بۆ شتێکی تری بەدەر لە ئامانجو حیکمەتە شەرعیەکە ئەنجامی بدات، ئەوا بە زیان بەسەریدا دەشکێتەوە، دوای ئەمە، واتە دوای سەردانی شەرعیانەی گۆڕستان، سەردانەکە یان حیسابی بیدعەی بۆ دەکرێ یان حیسابی شیرکی بۆ دەکرێ، دیارە ئەم دوو شێوازەش بە گوێرەی ئەو بیروباوەڕو نیەتو نیازو کردارانە دەناسرێن کە لە میانەی ئەنجامدانی سەردانەکەدا دەردەکەونو ڕێك پێچەوانەی ئەو بیروباوەڕو نیەتو نیازو کردارانەن کە لە شەرعی ئیسلامدا بۆ سەردانی گۆڕستان ڕەوچاو کراونو چرایان بۆ هەڵکراوەو دوورن لە هەر هۆکارێك سەری ئەنجامدەرەکەی لە زەلکاوی هاوبەش پەیداکردن بۆ خوداو توندڕەویو شلڕەوی دەربچوێنێت، بۆیە ئیسلام هاتووە هەندێك مەرجی بۆ بابای زیارەتکار داناون تا هەموو ئەو کونو کەلێنانەی لەبەردەم دابخا کە دزەی پێ دەکەن بۆ ئەو کارە خراپانە.[1]

مەرجی یەکەم: نابێ بکرێ بە جەژنگا، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((لاتجعلوا بیکوتکم قبوراً، ولاتجعلوا قبري عیداً، وصلُّوا علي، فإن صلاتكم تبلغني حیث کنتم))[2] واتە: نێو ماڵەکانتان نەکەن بە گۆڕستان، سەرگۆڕی من نەکەن بە جەژنگا، صەڵاوەتم لەسەر لێ بدەن، چونکە لە هەر کاتو شوێنێکدا بن صەڵاوەتی ئێوەم پێ دەگات. دیارە بە پێچەوانەی ئەو دابونەریتەی کە ئیمڕۆ هەندێك خەڵك باری پێوە گرتووە، لە ئیسلامدا ڕۆژێکی دیاریکراو نە لە هەفتە نە لە مانگ نە لە ساڵدا بۆ سەردانی گۆڕستان دانەنراوە.[3]

مەرجی دووەم: نابێ گەشتی بۆ ئەنجام بدرێ، أبو سعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: ((لاتشد الرحال إلا الی ثلاثة مساجد: مسجد الحرام ومسجد الأقصی ومسجدي))[4] واتە: تەنها بۆ سێ مزگەوت نەبێ نابێ گەشتی تایبەت بۆ هیچ شوێنێکی تر ڕێك بخرێت: مزگەوتی حەرامو مزگەوتی ئەقصاو مزگەوتی من. دیارە ڕێکگرتنی

---

١ القبورية في اليمن (ص: ٧٥).

٢ مسند أبي يعلى (١/٣٦١)، رقم (٤٦٩)، صحيح شواهده وطرقه حسنة.

٣ القبورية في اليمن (ص: ٧٦).

٤ مسلم مع شرح النووي (٩/١٠٤، ١٠٦).

پێغەمبەر (ﷺ) لە خۆگوشین بۆ غەیری ئەم سێ مزگەوتە، مەبەستی ئەوەیە کە نابێ هیچ شوێنێکی دووری بە دەر لەم سێ شوێنە بە مەبەستی تێدا ئەنجامدانی عیبادەتی خودا دیاری بکرێتو خەڵك کاروانی بۆ ڕێك بخاتو بۆ گەیشتن بۆ ئەو شوێنە خۆی بگوشێت.[1] نەچەسپاوە کە یەك کەس نە لە هاوەڵانو نە لە شوێنکەوتووانو نە لەو زانایانەی شوێنکەوتووی شوێنکەوتووانن سەفەری تەنها بۆ سەردانی گۆڕ یان مەشهەدێك ئەنجام دابێ، لە هیچ کامێکیشیانەوە نەهاتووە کە ئەم کارەی بە سوننەت دانابێ.[2] علامة صدیق حسین خان لە کتێبی (السراج الوهاج من کشف مطالب صحیح مسلم ابن الحجاج)داو، دوای هێنانی ڕایەجیاکانو توێژینەوەکردن لەسەریان دەڵێ: بەڵام ئەنجامدانی گەشت بۆ شوێنگەلێکی بەدەر لە گۆڕو گۆڕستان –وەك لە پێشدا نموونەیان لەسەر هێنرانەوە–، ئەوا بە بەڵگەی ڕاستو دروست چەسپاوە، لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)داو بەبەرچاوی ئەوەوە ڕووی داوەو، پێغەمبەریش (ﷺ) ئیقراری لەسەر کردووە، کەواتە هیچ بەڵگەیەك دەست ناکەوێ ڕێگە لە ئەنجامدانیان بگرێ، هەڵبەتە ئەمە بە پێچەوانەی ڕێکخستنو ئەنجامدانی سەفەر بۆ سەر گۆڕ یان گۆڕستان، چونکە لە سەردەمی ئەودا ڕووی نەداوەو یەك کەسیش لە هاوەڵانی بڕیاری لەسەر نەداوەو، لە هیچ کامێك لە فەرموودەکانیدا ئاماژەی بە پەسنکردنو ئەنجامدانی نەداوەو، نە بە گوفتارو نە بە کردار بۆ یەك کەس لە ئوممەتەکەی خۆی نەشەرعاندووە.[3]

٣ـ دروستکردنی خانوو لەسەر گۆڕو کردنی بە مزگەوت:

پێغەمبەری خودا (ﷺ) ڕێگری لە ئوممەتەکەی کردووە خانوو لەسەر گۆڕ بکەنو بە هیچ جۆرێك لە جۆرەکان بە گەورەو پیرۆزیان دابنێنو، هەواڵی داوە کە جگە لە خراپترین مەخلوق بە لای خوداوە کەسی تر ئەم کارە ناکات، جوندوبی کوڕی عبدالله (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێنج شەو بەر لەوە وەفات بکات گوێم لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بوو دەیفەرموو: ((الا وان من کان قبلکم کانوا یتخذون قبورا أنبیائهم وصالحیهم مساجد، ألا فلا تتخذوا القبور مساجد، إني أنهاکم عن ذلك))[4] واتە: بە ئاگا بن خەڵکانی بەر لە ئێوە گۆڕی

---

١ القبوریة في الیمن (ص: ٧٦).

٢ القبوریة في الیمن (ص: ٧٧).

٣ السراج الوهاج (٥/١١٦)، القبوریة في الیمن (ص: ٧٧).

٤ شرح النووي علی صحیح مسلم (٥/١٣).

پێغەمبەرانو پیاوە صاڵحەکانیان دەکرد بە مزگەوت، جا هۆشیار بن ئێوە گۆڕەکان نەکەن بە مزگەوت، من ڕێگریتان لێ دەکەم لەمە.

جابری کوڕی عبدالله (ڕەزای خوایان لێ بێت) وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) ڕێگری کرد لەوە گۆڕ بە گەچ دابڕێژرێتو خانووی لەسەر بکرێت.[1]

عبداللەی کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بوو دەیفەرموو: ((إن من شرار الناس من تدركه الساعة وهم أحياء ومن يتخذ القبور مساجد))[2] واتە: لە خراپترین چینی خەڵك ئەو کەسانەن زیندوونو دنیایان لەسەر وێران دەبێو ئەوکەسانەن گۆڕ دەکەن بە مزگەوت.

ئەم فەرموودانەی ڕابوردن بە ڕاشکاوی ڕێگری لە هەموو چەشنێك لە چەشنەکانی بە گەورەدانانو بە پیرۆزدانانی گۆڕ دەکەن لە: کردنی بە مزگەوتو دروستکردنی خانوو لەسەریو، دارشتنی سەری بە گەچ-و چیمەنتۆوکاشی-و، نوسین لەسەریو... هتد، ئەم ڕێگرتنو قەدەغەکردنە بۆ یەکەم جار ئاراستەی گۆڕی پێغەمبەرانو صاڵحان کراوە، لەبەرچی؟ چونکە ئەوان بە پێچەوانەی خەڵکانی تر زیادەڕەویان تێدا دەکرێو فیتنەی دەورەی گۆڕی ئەوان لە فیتنەی گۆڕی خەڵکانی تر گەورەترە، ئەمە لە هەموو شوێنێك واقیعێکی بەرچاوەو هەر گومبەزو مەشهەدێك دەبینی ئەوە بە بڕوای خەڵك لەسەر وەلییەکی چاكو پاكو کەرامەتدار کراوەو ئومێدی قازانگەیاندنو مەترسی پێنواندنی لێ دەکرێ، یان وەکو لە زۆر شوێنی ئەم سەر زەمینەی خودادا دەبینرێ هەر بە گۆترە دەوترێ ئەم گومبەزە لەسەر پێغەمبەرێك دروست کراوە، هەڵبەتە بەپێی ڕای بەهێزو ڕوونی زانایان زۆربەی زۆری پێغەمبەران بە یەقینی بە گۆڕەکانیان نازانرێ، جگە لە گۆڕی پێغەمبەر (ﷺ) هەندێك لەو زانایانە دەڵێن: هەروەها (ئیبراهیم خلیل)یش (علیه السلام) گۆڕەکەی لەو شوێنەی فەلەستینە کە ئێستا بە ناوی خۆیەوە ناوبانگی دەرکردووە،[3] (النووي) لەسەر ئەو فەرمودەی پێشدا قسە دەکاتو دەڵێ: زانایان وتوویانە: پێغەمبەر (ﷺ) تەنها ترسی زیادەڕەوی کران لە بەمەزندانانیو گرفتاربوونی خەڵك بە هۆیەوە، ڕێگری کردووە گۆڕەکەی بکەن بە مزگەوت، چونکە ئەمە بۆی هەیە سەر بکێشێت بۆ کافر بوون، وەك چۆن زۆرێك لە

---

١ شرح النووي على صحيح مسلم (٧/٢٧).

٢ المصدر نفسه.

٣ الفتاوى (٢٧/١٤٠).

ئوممەتە ڕابووردووەكان بە هۆی ئەم كارەوە سەریان لە كوفرو شیرك دەرچووبوو، كاتێكیش هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێ بێت)و شوێنكەوتووان بە هۆی زۆربوونی موسڵمانان پێویستیان بەوە بوو مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) بەرفراوان بكەن، كار بەوە گەیشت تەواوی هۆدەكانی دایكانی ئیمانداران بە حوجرەی خاتوو عائیشەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) واتە ئارامگای پێغەمبەری خودا (ﷺ)و بە گۆڕی هەردووك هاوەڵەكەیەوە أبوبكرو عمر (ڕەزای خوایان لێ بێت) كەوتنە بازنەی ئەم فراوان كردنەوە. بە خاتری ئەوەلەنێو مزگەوتدا دیار نەبێو خەڵكی عەوام لە كاتی نوێژدا ڕووی تێ نەكەنو تووشی بێ شەرعی نەبن هاتن تامانێكی بازنەییان لە دەورە دا، ئەمجا لە باری سەری هەردووك جەمسەرەكەیەوە دوو دیواریان بەرزكردنەوەو بە پێچ لەمسەرەوسەرەوە بە یەكتریان گەیاندنەوە هەتا كەس نەتوانێ ڕوو لە گۆڕەكە بكات، دیارە هەر لەبەر ئەمەش ئەمەی لە فەرموودەكەدا فەرمووە، ئەگەر ئەم بابەتە لە گۆڕێدا نەبووایە گۆڕەكەی بەدەر دەخرا، بەڵام ئەو ترساوە بكرێ بە مزگەوت، والله أعلم بالصواب.[1]

پێغەمبەری خودا (ﷺ) لەگەڵ فەرمانكردنی بە تێكدانی سەرو صورەتی پەیكەرە بت، فەرمانی بە تەختكردنی گۆڕ كردووە، أبوهیّاجی ئەسەدی (ڕەحمەتی خوای لەسەر بێ) دەڵێ: عەلی كوڕی أبي طالب (ڕەزای خوای لێ بێت) پێی وتم: ئایا چۆنە بە ئەمیرایەتی بۆ ڕاپەڕاندنی ئەركێكت بنێرم، كە كاتی خۆی پێغەمبەری خودا (ﷺ) منی بۆ ناردبوو؟ دەچی هەر پەیكەرو وێنەیەكت هاتە بەرچاو سەرو صورەتی دەشێوێنیو هەر گۆڕێكی بەرزیشت بینی لەگەڵ زەوی تەختی دەكەی.[2] ئا ئەمە عەلی ئەمیری ئیماندارانە (ڕەزای خوای لێ بێت) كە أبو هیّاجی سەرۆكی شورتەكانی بۆ تەختكردنی گۆڕ دەنێرێ، چۆن پێغەمبەری خودا (ﷺ) هەمان كاری بە ئەو سپاردبوو، واتە: عەلی ئەو شتە جێبەجێ دەكات كە لە ڕێی فەرمانی پێغەمبەری خودا (ﷺ)ەوە زانیویەتیو تێی گەیشتووە.[3] زانایان بە ڕاشكاوی ڕایانگەیاندووە كە لە سەدە زێڕینەكاندا -واتە سەدەی یەكەمو دووەمو سێهەم-دا هیچ مەشهەدو گومبەزی سەر گۆڕ لە ئارادا نەبوون، إبن تیمیة لە میانەی باسی مەشهەدی سەری حوسێندا دەڵێ: سەرەتای سەردەمی عەباسیەكان واز لێ بێنە، چونكە ئەوان ئەو دەمە لە ڕاوەستاویو لوتكەی هێزو دەسەڵاتو توندو تۆكمەییاندا بوون، نە لە سەردەمی هاوەڵانو

---

١ شرح النووي على صحيح مسلم (١٢/٥، ١٣).

٢ شرح النووي على صحيح مسلم (٣٧/٧).

٣ القبورية في اليمن (ص: ٥٤).

شوێنکەوتووان‌و شوێنکەوتووی شوێنکەوتووانداو، نە لە هیچ کامێك لە وڵاتانی ئیسلام، نە لە حیجاز نە لە یەمەن‌و نە لە شام‌و عێراق‌و نە لە مصرو نە لە خۆراسان‌و نە لە مەغریبدا دروستکردنی خانووبەرەو گومبەزی سەرگۆڕ دانەهێنرابوو، نە پێغەمبەر (ﷺ)و نە هیچ کامێك لە هاوەڵان‌و نە هیچ کەسێکیش لە ئەندامانی ئالوبەیت‌و نە هیچ پیاوێکی صالح گومبەزو مەشهەدی لەسەر دروست نەکرابوو، بەڵکو تەواوی ئەو مەشهەدانە دوای ئەم سەردەمانەو لە کۆتاییەکانی سەدەی سێهەم‌و سەردەمی دەوڵەتی (المقتدر)و دوابەدوای لاوازبوونی خیلافەتی عەباسی‌و پەرتەوازەیی ئوممەت‌و زۆربوونی خەڵکانی فێڵبازو دووڕوو و زندیق‌و سەرکەوتنی قسەی خەڵکی بیدعەچی دروستکردنی ئەم مەشهەدو گومبەزانە سەریان هەڵداو پەرەیان پێ درا. لەو دەمەدا قەرامیطەی عەبیدی قەداحی لە وڵاتی مەغریب سەریان هەڵداو، ئەمجا هاتنە وڵاتی میصرو، هاوکات لەگەڵ ئەمانەدا بوەیهیەکانیش دەرکەوتن کە خەڵکانی زندیق‌و بیدعەچی زۆریان تێدا بوون، ئەمەو لە سەردەمی دەوڵەتی قەرامیطەداو لە وڵاتی مصر (بنو القداح) بەهێزبوون‌و لە سەردەمی دەوڵەتی بوەیهی‌و لە عێراقداو لە نەجەف بینای ئەو مەشهەدە کرا کە پاڵیان دایە لای عەلی (ڕەزای خوای لێ بێت)، دەنا بەر لە ئەمە کەس نەیدەوت گۆڕی عەلی لێرەیە، بەڵکو عەلی (ڕەزای خوای لێ بێت) لەنێو کۆشکی ئیمارەتی کوفەدا نێژرابوو، یەکێك لە هاوەڵانی (ڕەشید) دەڵێ: ڕەشید هاتە سەر ئەو شوێنەو عوزرخواهی بۆ ئەوکەسە هێنایەوە کە لە نێویدا نێژرابوو، جا وتیان ئەوە عەلی یەو ئەوە لە بەرانبەر ئەو ڕەفتارانەی لە بەرانبەر ڕۆڵەکانی ئەودا ئەنجامی دابوون داوای لێبوردنی لێکرد، جا وتیان ئەمە گۆڕی عەلی یە، خەڵکانێکی تر وتیان: ئەمە گۆڕی موغیرەی کوڕی شوعبەیە.[1]

(الذهبي) دەربارەی (عضد الدولة)ی بوەیهی دەڵێ: شیعەیەکی یەجگار توند بوو، لە (نەجەف) گۆڕێکی دیاری کردو هەر بە گوترە وتی ئەمە گۆڕی (ئیمام عەلی)یە، گومبەزێکی لەسەر دروست کردو، دروشمی ڕەفزو شیعەگەری‌و شیوەنی عاشوراو ئیعتیزالی بەرزکردنەوە، ئەمجا (الذهبي) وتی: بەم شێوەیە (عضد الدولة) لەسەر ئەم کارانەی کۆتایی بە ژیاننامەی هێنرا، وتم: سوپاسی خودای بەرزو باڵا لەسەر ساغ‌و سەلامەتی، لە ڕاستیدا لە سەدەی چوارەمدا ئیسلام لە خۆرئاواو خۆرهەڵاتەوە تووشی بەڵای توندی خۆی بوو، لە خۆرئاواوە بە هۆی پەیدابوونی دەوڵەتی عەبیدیەوەو، لە خۆرهەڵاتەوە بە هۆی هاتنە ئارای دەوڵەتی

---

١ الفتاوى (٢٧/٢٤٥).

بوەیهی و قەرامیطە عەرەبە دەشتەکیەکانەوە، بەڵام هەموو شتێك بە دەست خودایە.[١] إبن کثیر سەبارەت بە رووداوەکانی ساڵی ٣٤٧ك دەڵێ: وڵات پڕکرا لە شیعەگەلی حەمدانی و فاطمی و دنیایان پڕکرد لەجنێوگوتن بە هاوەڵان و ڕەفزکردنی ئەوان، مەلیك و حوکمڕانانی تەواوی وڵاتانی مصر و شام و عێراق و خۆراسان و ئەمانە و بە وڵاتی حیجاز و زۆربەی خاکی مەغریبەوە شیعەی ڕافیزی بوون، لە لایەن ئەمانەوە جوێنی زۆر بە هاوەڵان دەوتران.[٢] قسەکانی (السمهودی)یش بەر ڕەحمەتی خودا بکەوێت کە لە باسی گۆڕی فاطمەدا (ڕەزای خوای لێ بێت) لە کتێبی (وفاء الوفاء بأخبار دار المصطفى)دا دەیانکا پشتگیری لەم ڕایە–ی الذهبي– دەکەن، ئەو دەڵێ: بە هۆی دروست نەکردنی خانوو لەسەریان و دانەڕشتنی سەریان بە گەچ، سەری کێشاوە بۆ نەناسران و پێ نەزانزانی خودی گۆڕی فاطمە و خەڵکانی غەیری ئەویش لە سەلەفی صالح خودا لە هەموویان ڕازی بێت.[٣]

الشافعي (ڕەحمەتی خوای لەسەر بێ) دەڵێ: گۆڕی کۆچەران و پشتیوانانم نەبینیون بە گەچ داڕێژرابن، ڕاوی لە (طاوس)ەوە ڕیوایەت دەکات: ((پێغەمبەری خودا (ﷺ) ڕێگری کردووە گۆڕ خانووی لەسەر بکرێت یان بە گەچ دابڕێژرێت))، شافیعی وتی: لە مەککەدا دەمبینی والیەکان هەموو ئەو دیوارو کەڵەکانەیان دەڕوخاندن کە لە دەورەی گۆڕ دروست دەکران، نەمبینیوە زانایانی ئەوێ لەسەر ئەمە ڕەخنەیان لێ بگرن.[٤]

حەقیقەتی مێژوو دەڵێ: سێ سەدە زێڕینەکە تێپەڕین و هیچ گۆڕێکی قەبە و بە بەرز و پیرۆز دانراوو مەشهەدو گومبەز و دیاردەیەك لە دیاردەکانی مەرقەدپەرستی و ڕێوڕەسمە عیبادەتیەکانی گۆڕ و مەرقەد لە گۆڕێدا نەبوون، هەر هەوڵێکی شیعەکان لەم بوارەدا داویانە ڕووبەڕووی وەڵامی توندو پەرچەکرداری بەهێزی خەلیفەکانی –وەك أبو جعفری منصوری عباسی و هارونەڕەشید– بۆتەوە.[٥]

## چوارەم: دەرچوونی حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) لە تەرازووی شەرعدا:

لە ڕاستیدا قووڵ نەبوونەوە لە بابەتی هەڵوێستی بەرهەڵستکارانی حوسێن لە دژی یەزیدو ئەنجامنەدانی کاری پێویست بۆ لێکۆڵینەوەی ڕیوایەتە مێژووییەکانی تایبەت بەم ڕووداوە، وای لە هەندێك کەس کردووە پێیان وابێ: حوسێن بەم کارەی لە فەرمانی ئیمام دەرچووەو،

---

١ سير أعلام النبلاء (١٦/٢٥٠، ٢٥٢).

٢ البداية والنهاية (١١/٢٣٣)، نقلا عن القبورية في اليمن (ص: ١١٨).

٣ وفاء الوفاء بأخبار دار المصطفى (٣/٩٠٦).

٤ الأم للشافعي، نقلا عن القبورية في اليمن (ص: ١٣٢، ١٣٣).

٥ القبورية في اليمن (ص: ١٣٢، ١٣٣).

ئەو کارەساتەی لەم ڕێیەیدا تووشی هاتووە بەشێکی عادیلانەیەو دادپەروەرانە بووە کە بەری کەوتووە، دیارە ئەمە بە گوێرەی ئەو فەرموودە چەسپاوانەی لە پێغەمبەر (ﷺ)ەوە ڕیوایەت کراون‌و هێرش دەکەنە سەر ئەو کەسەی لە دژی ئیمام دەردەچێ، ئەوەتا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((من أراد أن يفرق بين المسلمين وهم جميع فاضربوه بالسيف كائناً من كان))[1] واتە: هەرکات موسڵمانان کۆك بوون‌و، یەکێك ویستی پەرتەوازە بخاتە نێویانەوە، ئەوا ئەو کەسە هەر کەسێك بوو بەر شمشێری خۆتانی بدەن. (السيوطي) دەڵێت: بەپێی ئەو واتا گشتیەی لە فەرموودەکە دەفامرێتەوە: ئەو کەسە چ شەریف‌و شکۆدار بێ، چ گەداو بێ داروبار بێ، ئێوە لێی دەن.[2] (النووي) قسە لەسەر ئەم حەدیسە دەکات‌و دەڵێ: لێرەدا فەرمان بە ئەنجامدانی جەنگ‌و کوشتار کراوە لە بەرانبەر هەر کەسێکدا لە دژی ئیمام دەردەچێ، یان دەیەوێ دووبەرەکی بخاتە نێو موسڵمانانەوە، یان هەر شتێکی تری لەم بابەتە، سەرەتا داوای لێ دەکرێ واز بێنێ‌و دەستبەرداری ئەم کارەی بێ، ئەگەر کۆڵی نەدا جەنگی لەگەڵ دەکرێ، ئەگەر جگە لە کوژرانی هیچ چارەیەکی تر دەست نەکەوت بۆ کۆتایی پێهێنانی ئەو ئاشوبەی ناویەتیەوە، ئەوا دەکوژرێت‌و خوێنیشی بە خۆڕایی دەڕوات.[3] لەم حەدیسەو هاوشێوەکانیدا پێغەمبەر (ﷺ) جەختی لەسەر ئەم ڕاستیە کردۆتەوە، کە هەر کەسێك لە دژی ئیمامی موسڵمانان ڕاپەڕێ ئەوا بێ چەندو چوون سزاکەی بریتیە لە کوشتن، چونکە ئەو بەم کارەی ویستوویەتی یەکدەنگی‌و یەکڕەنگی موسڵمانان تێك بدات، پابەندبوونی مەبدەئیانە بەم دەقانەوە وای لە کەسانێکی زۆر کردووە بڵێن: گوایە (أبوبکری ئیبنولعەرەبی) وتوویەتی: حوسێن بە شمشێری باپیری (ﷺ) کوژراوە.[4] هەر وشك تێگەیشتن لەم فەرموودانە وای لە خەڵکانێکی بە نموونە (کەرامیە) کردووە بڵێن: حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) لە بەرانبەر یەزیددا حیسابی باغی‌و ستەمکارو یاخی بۆ دەکرێ، کەواتە بڕیاری سزادان‌و کوشتن دەرهەق بە ئەو بە ڕاست دەگەڕێ.[5] لە بەرانبەر ئەمانەدا کەسانێکی تر پێیان وایە دەرچوونی حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) دروست‌و ڕاست بووەو بە حیسابی ئەوان ئەو کارێکی شەرعی ئەنجام داوە، بە بەڵگەی ئەوە حوسێن لە یەزید

---

١ شرح النووي على صحيح مسلم (١٢/٢٤١).

٢ عقد الزبرجد للسيوطي (١/٢٦٤).

٣ شرح النووي على صحيح مسلم (١٢/٢٤١).

٤ العواصم من القواصم (ص: ٢٤٤، ٢٤٥).

٥ نيل الأوطار (٧/٣١٢).

جوامێرو شکۆدارترو لەپێشتر بووەو، بە هیچ کلۆجێك یەزید هاوشانی ئەو نەبووە.[١] هەندێکی تریش پێیان وایە دەرچوونی حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) بە هۆی دەرکەوتنی کاری خراپو نەشیاو لە یەزید کارێکی شەرعی بووە.[٢] بەڵام ئەگەر بێین خودی دەرچوونەکەی حوسێن‌و کوژرانەکەی شی بکەینەوەو، توێژینەوەیەکی جیددی لەسەر بکەین، دەبینین کە شتەکە نە بەم شێوەیەیە کە ئەوانە لێی حاڵی بوون‌و، نە بەو شێوەیەشە کە بەرانبەرەکانیان بە پێچەوانەوە تێی گەیشتوون، حوسێن ئەصڵەن بەیعەتی نەدابوو بە یەزیدو، ئەو لە دژی بیری بە میراتگرتنی دەسەڵات لە باوکەوە بۆ کوڕو لە پێناو بەرگری کردن لە شوڕاو هەموو ئەو بنەمایانەی ئیسلام کە داکۆکی لەسەر مافی ئۆممەت دەکەن بۆ هەڵبژاردنی ئەو کەسەی ئەو دەیەوێ، هەستایە سەرپێ‌و ڕاپەڕی، (عبدالله ی کوڕی زوبێر)ی لەگەڵ دەرچوو و بە خاتری کۆکردنەوەی پشتیوان‌و لایەنگران‌و هاندانی موسڵمانان بۆ وەستان لە دژی ئەو لادانەی لە سیستەمی حوکمڕانیدا ڕووی داوەو، لە شوڕاوە بەرەو بنەماڵەیی‌و ماڵەمیراتی وەرسوڕاوە، لە مەدینەوە بەرەو مەککە دەرچوون‌و، ویستی هیممەتی خەڵك بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو پرۆژە چەوتە بجوڵێنێ کە لە جیهانی ئیسلامدا سەری دەرهێناوە، ئەمەو گەشتەکەی حوسێن لە پێناو کۆکردنەوەی شوێنکەتوو و پشتیوانان بۆ ڕاستکردنەوەی سیستەمی حوکم‌و گێڕانەوەی سیستەمی شوڕاو پەیڕەوی خیلافەتی ڕاشیدەو مەبدەئە بەهادار و گرنگەکان دەستی پێکرد، ئەمە هیچ بەو شێوەیە نیە کە هەندێك پێیان وایە: گوایە حوسێن تەماعی لە کورسی دەسەڵاتدا بووەو ویستوویەتی بەم دەرچوون‌و ڕاپەڕینەی ئەم کورسیە بۆ خۆی‌و نەوەکانی داگیر بکات، بێگومان ئەم تێڕوانین‌و تێڕامانەی ئەمانە بە کەمگرتنی حوسێن‌و پەیڕەوەکەی‌و ئالوبەیت‌و پەیڕەوی قورئان‌و سوننەتی باپیری حوسێن (ﷺ)ی لەخۆگرتووە.[٣]

لە لایەکی ترەوە ئەو ڕایەی کە دەڵێ دەق لەسەر چەسپاندنی حوکم بۆ عەلی‌و نەوەکانی هەیە، قسەیەکی هەڵبەست‌و پەڵیت‌و چەوتە، چونکە نە لە بەسەرهاتەکەی کەربەلاداو نە لە هی غەیری کەربەلادا شوێنەوار یان ڕیوایەتێکی صەحیح‌و ڕاست‌و دروست نەهاتووە پشتگیری لە بیردۆزەی دەق بکات،ئوستاد أحمد الکاتب لە کتێبی (تطور الفکر السیاسی الشیعي من

---

١ نيل الأوطار (٢١٢/٧).

٢ الدرة فيما يجب إعتقاده (ص: ٣٧٦)، المقدمة (٢٧١/١).

٣ عمر والحسين، نقلا عن علاء الدين المدرس (ص: ٥٢).

الشوری الی ولایة الفقیة)[١]دا قسەی لەسەر ئەم بابەتە کردووە، منیش لە کتێبی (علي بن أبي طالب)دا لێکۆڵینەوەم لەسەر (بیردۆزەی دەق) لەسەر حوکمڕانی عەلیو نەوەکانی کردووەو دوومەڵی بەڵگەگەلی پەیوەست بەم بابەتەی شیعەکانم بەرنەشتەری توێژینەوە داون.

حوسێنی کوڕی عەلی (ڕەزای خوای لێ بێت) بەیعەتی بە یەزیدی کوڕی معاویە نەدا، بەڵکو دەستی بە ئامادەسازیو کۆکردنەوەی هێزی مادیو بەشەری کرد، لەم پێناوەدا لە پەیڕەوو ڕێوشوێنەکانی ئیسلام بۆ ئامادەسازی سەربازی دەرنەدەچوو. گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە هێندەی هێز ساز کردووە بتوانێ حوکمڕانی ستەمکارو نادروستی پێ لابەرێ، ئامانجی خۆی پێ بهەنگێوێ، بەڵام بێگومان کە لەو شتانەی لە مێشکی خۆیدا حیسابی بۆ کردبوون بە هەڵەدا چووبوو.[٢] حوسێن هەڵەیەکی وای نەکرد ناشەرعی بێتو پێچەوانەی دەقەکان بێت، بە تایبەتی ئەگەر ئەوەمان زانی کە بەشێك لە حەدیسەکان هاتوونو بوونەتە ڕوونکەرەوەی جۆری دەرچوون –لە دژی حوکم–.

عبدالله ی کوڕی عمر (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: ((الصلاة المکتوبة الی الصلاة التي بعدها کفارة لما بینهما، والجمعة الی الجمعة، والشهر إلی الشهر –یعني الرمضان– کفارة لما بینهما)) واتە: بەرپاکردنی دوو نوێژی فەرز بە دوویەکدا دەبنە مایەی سڕینەوەی ئەو گوناهانەی لەنێوان ئەم دوو نوێژانەدا کراون، هەروەها جومعە بۆ جومعەو ڕەمەزان بۆ ڕەمەزان دەبنە مایەی سڕینەوەی گوناهەکانی نێوانیان، (عبدالله) وتی: ئەمجا دوای ئەوە فەرمووی: ((إلاّ من ثلاث)) واتە: جگە لە سێ تاوان، واتە ئەو سێ تاوانانە ناسڕێنەوە، ئیبنو عومەر وتی: وتم: لێرە دەزانم کە ئەمە شتێکی گەورەیە،جا فەرمووی: ((إلاّ من الإشراك بالله، ونکث الصفقة وترك السنة)) واتە: جگە لە هاوەڵدانان بۆ خودا، پەیمان شکاندنو پشتکردن لە سوننەت، عبدالله وتی: بەڵام پەیمان شکاندن: بریتییە لەوە بەیعەت بە کەسێك بدەیتو ئەمجا لە دژی بوەستیتو بە شمشێرەکەت جەنگی لەگەڵ بکەی، هەرچی (پشتکردن لە سوننەت)یش: بریتییە لە دەرچوون لە کۆمەڵی موسڵمانان.[٣]

حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) هەروا لە خۆوە دەرنەچووبوو، بەڵکو هاتە سەر ئەو بڕوایەی خەڵك گوێڕایەڵیو فەرمانبەرداری بۆ دەکەن، جا کاتێك بینی پشتی تێ دەکەنو لە دەوری

---

١ تطور الفکر السیاسي الشیعي من الشوری الی ولایة الفقیه (ص: ١٨).

٢ الدولة والمجتمع في العصر الأموي (ص: ١٦٥).

٣ مسند أحمد (٩٨/١٢)، إسناده صحیح.

دەتەکنەوە، داوای کرد یان بەرەو شوێنی خۆی بگەڕێتەوە، یان بەرەو یەکێك لە سەنگەرە سەرسنوورییە جیهادیەکان بچێ، یان بەرەو لای یەزید بەڕێ بکەوێ،[١] بەلام ئیبنو زیاد لە بەرانبەر ئەم نەرمنواندنەی حوسێندا، لاملی نواند، ئەوکە پێویست بوو لەسەری وەلامی یەکێك لە داواکاریەکانی بداتەوە بەلام نەك هەر ئەمەی نەکرد، بەلکو داوای شتێکی زۆر گەورەی لە حوسێن کرد، کە بریتی بوو لەسەر حوکمی ئەو دابەزێ‌و خۆ بە دەستەوە بدات، هەلبەتە شتێکی سروشتیە کە حوسێن ئەم داوایە ڕەفز دەکات، بەلکو هەقیشی بوو ڕەفزی بکات، جگە لە خودا کەس نەیدەزانی ئەنجامی دابەزین‌و خۆبەدەستەوەدان لەسەر حوکمی ئیبو زیاد چ دەبێ‌و بە کوێ دەگات، زۆر پێ دەچوو حوکمەکەی کوشتنیشی تێدا بێت، لە لایەکی ترەوە ئەم داوایەی ئیبنو زیاد هەمان داوا بوو کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەیخستە بەردەم کافرانی جەنگی‌و دوژمنانی ئیسلام، (حوسێن)یش نەك هەر لە ڕیزی ئەمانەدا نیە، بەلکو لە ڕیزی کەسایەتیە شکۆدارەکانی ئیسلامەو سەیدو سەروەری ئەوانیشە.[٢] لەبەر ئەمەیە کە: إبن تیمیة دەلێ: حوسێن لەسەری واجب نەبوو داوای ئیبنو زیاد بۆ خۆبەدەستەوەدان‌و ئەسیرکرانی جێبەجێ بکات.[٣] لە ڕاستیدا ئیبنو زیاد کاتێك هەنگاوی بەرەو کوشتنی حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) هەلێنا، لە سیاسەتی شەرعی هەلگەڕایەوە،[٤] کەواتە ستەمکار ئیبنو زیادو شەربازانی ئەو سوپایەی بوون کە دوای ڕەفزکردنی پێشنیارەکانی حوسێن بۆ صولح هێرشیان کردە سەرو کوشتیان، لە لایەکی ترەوە وەك یوسف العش دەلێ: نابێ لە ئامۆژگاری‌و پێشنیاری هاوەلان بۆ حوسێن وا بفامرێتەوە کە ئەوان پێیان وابووە حوسێن لە دژی (ئیمام) دەرچووە،[٥] بەلکو هاوەلان (ڕەزای خوایان لێ بێت) هەستیان بە ترسناکی دانیشتوانی کوفە لەسەر حوسێن کردبوو، ئەوانیان دەناسی‌و دەیانزانی کە درۆزنن، ئیتر چۆنیەتی دەربڕینی ئامۆژگاریەکانیان تەنها ئەم ڕاستیەیان لێ دەفامرێتەوەو بەس.[٦] إبن خلدون دەلێ: جا بەمە هەلەی حوسێن ڕوون بۆوە، بەلام سەبارەت بە ڕووکارە دونیاییەکە هەلەکەی بەسەردا ناشکێتەوەو زیانی لێ نادا، بەلام

---

١ منهاج السنة (٤/٤٢).

٢ مواقف المعارضة (ص: ٣٢٩).

٣ منهاج السنة (٤/٥٥).

٤ مواقف المعارضة (ص: ٣٢٠).

٥ الدولة الأموية (ص: ١٦٨).

٦ مواقف المعارضة (ص: ٣٣٠).

سەبارەت بە حوکمی شەرعی دەرچوونەکەی نەکەوتۆتە هەڵەوە، چونکە حوکمەکە پەیوەست بووە بە بۆچوون‌و تێڕوانینی ئیجتیهادیانەی خۆی کە توانای بەسەر ئەنجامدانی ئەم کارو پڕۆژەیەدا هەیە.[1] بەڵام سەبارەت بە هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێ بێت) ئەوانەی کە لە حیجازو میصرو عێراق‌و شام بوون‌و، ئەوانەش کە بە دوای حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) نەکەوتن، ئەم کارەی ئەویان بە خراپ دانەناو، نەیانوت کە گوناهبارە، چونکە ئەو موجتەهید بوو، بەڵکو پێشەنگی زانایانی موجتەهیدی سەردەمی خۆی بوو.[2] إبن تیمیة دەڵێ: ئەو حەدیسانەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرمانیان تێدایە بە کوشتنی کەسێك دووبەرەکی دەخاتە نێو جەماعەتی موسڵمانانەوە حوسێن ناگرنەوەو، ئەو بەر حوکمی هیچ کامێکیان ناکەوێ، چونکە ئەو (ڕەزای خوای لێ بێت) کاری دووبەرەکی ئەنجام نەداو، هێرشی نەکردە سەر کەس بیکوژێ، بەڵکو داوای کرد یان بۆ وڵاتی خۆی بگەڕێتەوە، یان بەرەو یەکێك لە سەنگەرەکانی پێشەوەی جیهاد بچێ، یان بەرەو لای یەزید بڕوات‌و، بەم شێوەیە هەر لەنێو جەماعەتدا دەمێنێ‌و، پشت لە پەرتەوازەکردنی ئوممەت دەکا، خۆ ئەگەر نزمترین کەسایەتی ئەم داوایەی بخستبایە ڕوو واجب بوو وەڵامی بدرێتەوە، جا چ جای حوسێن، دەبوو چۆن وەڵامی نەدرێتەوە؟[3] ئەو لە پێناوی ویلایەت‌و پۆستی حوکمڕانی نەجەنگا، بەڵکو دوای خستنەڕووی سێ پێشنیارە صوڵحئامێزەکەی کوژرا.... بەڵکو لە حاڵەتێکدا کوژرا کە بەرگری لە خۆی دەکردو نەیدەویست‌و نەیدەهێشت ببێ بەدیل، جا بە ستەملێکراوی کوژرا.[4]

## پێنجەم: هەندێك خەون لەسەر بەسەرهاتی حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت):

لە ڕستەی ئەو خەونانەی بە کوژرانی حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت)ەوە پەیوەستن: عبدالله ی کوڕی عباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: ڕۆژێك لە خەونمدا لە کاتی نیوەڕۆدا پێغەمبەر (ﷺ)م بینی، قژ هاڵۆزو دەموچاوی خۆڵاوی بوو، قاپێکی پێ بوو، خوێنی هەڵدەگرتەوەو تێی دەکرد، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەمە چییە؟ فەرمووی: ((دم

---

١ المقدمة (١/٢٧١).

٢ مقدمة إبن خلدون (١/٢٧١).

٣ منهاج السنة (٤/٥٥٦) بتصرف.

٤ منهاج السنة (٤/٣٤٠) بتصرف.

الحسين وأصحابه لم أزل أتتبعه منذ اليوم)) واتە: خوێنی حوسێنو هاوەڵانیەتی ڕژاوە، لە سەرەتای ئیمڕۆوە بەردەوام لێی دەگەڕێم تا هەڵی بگرمەوە. (عەماری کوڕی عەمار) کە گێڕەرەوەی ئەم حەدیسەیە دەڵێ: ئەو ڕۆژەمان نیشانە کرد، دوایی تەماشامان کرد کە لە ئەو ڕۆژەدا کوژرابوو.[1] ئەم حەدیسە کە سەنەدەکەی دەچێتەوە سەر عبدالله ی کوڕی عەباس صەحیحو ڕاستو دروستە.[2]

إبن سعد بە زنجیرە سەنەدەکانی خۆیەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: وتیان: حوسەین ڕێگای عوذەیب[3]ی گرتەبەرو ڕۆیشت هەتا گەیشتە کۆشکی (أبو مقاتل)،[4] سەرخەوێکی سوکی شکاندو هەستاو، (إنا لله وإنّا إليه راجعون)ی کردو، وتی: لە خەونمدا دەتوت سوارێك لەگەڵمان دەڕواتو، دەیوت: پیاوەکان بەرەو پێشەوە دەڕۆنو مەرگیش بەرەو ڕوویان دێ.[5] خەڵكانێك وتیان: حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) لەسەر بنەمای خەونێك کە بە پێغەمبەری خودا (ﷺ)یەوە بینیبوو لە دژی یەزید دەرچوو، لەم خەونەیدا پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمانی بە ئەنجامدانی کارێك پێ کردبوو کە لە ڕۆژی بەڕێوەبریاری ئەنجامدرانی بۆ لەسەر دراوە.[6] کەسانێك لە وەرگرتنی ئەحکامی شەرعیدا پشتیان بە خەون بەستووە، (الشاطبي) دەڵێ: ئەوانەی لە ڕووی بەڵگەهێنانەوە لە هەموو تاقمێك لاوازترن، بریتین لە خەڵكانێك بۆ ئەنجامدانی کاروبار پشت بە خەونو مەقامات دەبەستن، بە هۆی ئەمەوە ڕوو لە هەندێ شت دەکەنو پشت لە هەندێ شت دەکەنو، دەڵێن: لە خەونمدا فلانەکەسمان بینی کە پیاوێکی صالح بووە، پێی وتین: ئەم کردەوانە بکەنو ئەمانەش واز لێ بێنن، وێنەی ئەم تەرزە خەونانە زیاتر ئەو کەسانە باسیان لێوە دەکەن کە خۆیان لە بەرگی تەصەووفدا دەردەخەن، جار هەیە یەکێکیان دەڵێ: بە خەون پێغەمبەر (ﷺ)م بینیو ڕووی تێ کردمو ئەمەی پێ فەرمووموو، فەرمانی بە ئەو شتە پێ کردم، جا ئیتر بە گوێرەی ئەم خەونانە هەندێك کردەوە دەکەنو هەندێکی تر تەرك دەکەنو، ڕوو لە سنووری ڕەسمکراوەکانی شەریعەت وەردەگێڕن، بێگومان ئەمە هەڵەیە، چونکە جگە لە خەونی پێغەمبەران خەونی کەسی تر

---

١ فضائل الصحابة رقم (١٣٨٠)، إسناده صحيح.

٢ حقبة من التأريخ (ص: ١٣٧).

٣ عوذەیب: ئاوێکە لە نێوان قادسیەو موغیثەدایە.

٤ لە نێوان عين التمر والشام دایە، معجم البلدان (٣/٣٦٤).

٥ سير أعلام النبلاء (٣/٢٩٨).

٦ سير أعلام النبلاء (٣/٢٩٧).

حوکمیان پێ ناکرێ، مەگەر لە حاڵێکدا ئەو خەونە بخرێتە ژێر تیشکی حوکمە شەرعیەکان و ئەگەر هاوڕێك بوو تەئکیدی لەسەر جێبەجێ کردنی حوکمێکی شەرعی دەکردەوە ئەوا ئیشی پێ دەکرێت، ئەگەرنا دەبێ وەلا بنرێت، چونکە سودێك کە لە خەون ببینرێ بریتیە لە موژدەو ئاگادارکردنەوە، نەك وەرگرتنی حوکم.[١] ئەمە جگە لەوە کە هەر خەونێك دەبینرێ بۆی واجب نەکراوە پارێزراو بێ، بەڵکو دەبێ لە بەرانبەر شەرع ڕاگیرێ، ئەگەر لەگەڵ شەرع هاتەوە، ئەوە حوکمی شەرع بەو شێوەی خۆی کە هەیە جێگیر دەکرێ، چونکە جێبەجێکرانی حوکمەکان لەسەر خەون ڕاناگیرێن داخۆ چۆن و کەی کاریان پێ بکرێ، خۆ ئەگەر پێچەوانەی شەرع هاتەوە ئەوا حاڵ و پلەو پایەو مەقامی (خەونبین) و (خەونپێوەبینراو) هەر چۆنێك بێ لەبەر چاو ناگیرێت و ڕەت دەکرێتەوە، بەم جۆرە حوکم بەسەر ئەم جۆرە خەونەو هاوشێوەکانیدا دەدرێ کە لە شەیتانەوەن و درۆو دەلەسەو هەڵیت و پەڵیتن.[٢] بەڵام ماوەتەوە بڵێین: سوودی ئەو خەونە چیە کە لەگەڵ شەرع دێتەوە، ئەگەر بەر لە ئەمە حوکمی شەرعی لەسەر ئەم بابەتە جێگیر بووبێ؟،[٣] دیارە بریتیە لە بەئاگاهێنانەوەو موژدەدان، وەك لەو فەرموودەدا هاتووە کە بوخاری لە ئەبی هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێت)ەوە گێڕاویەتیەوەو دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بوو دەیفەرموو: ((لم يبق من النبوة إلا المبشرات)) واتە: جگە لە موژدەهەواڵ هیچ شتێکی تر لە بابەتی پێغەمبەرایەتی نەماوە. وتیان: موژدەهەواڵەکان چین؟ فەرمووی: ((الرّؤيا الصالحة))[٤] واتە: خەونی چاك و ڕێکوپێك. ئیتر جار هەیە مرۆڤی باش لە خەونیدا شتێکی دڵخۆشکەر یان دڵشێوێنەر دەبینێ، بە هۆی ئەمەوە هان دەدرێ بۆ ئەنجامدانی ئەرکێکی خوازراو یان تەرککردنی کردەوەیەکی قەدەغەکراو.[٥]

## شەشەم: هەواڵدانی پێغەمبەر (ﷺ) بە کوژرانی حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت):

ئومو سەلەمە وتی: جبریل لە لای پێغەمبەر (ﷺ) بوو، حوسێن لە لای من بوو گریا، منیش وازم لێ هێناو خۆی بە ژووری پێغەمبەر (ﷺ)دا کرد، لێی نزیك بۆوە، جبریل وتی:

---

١ الاعتصام (١/٢٦٠)، دراسة في الأهواء والفرق والبدع (ص: ٣٠١).

٢ منهج الاستدلال على مسائل الإعتقاد (٢/٦٨٧).

٣ المصدر نفسه (٢/٦٨٧).

٤ البخاري (رقم: ٦٩٩٠).

٥ منهج الاستدلال على مسائل الإعتقاد.

ئەی محمد خۆشت دەوێ؟ فەرمووی: ((نعم)) وتی: لەمەولا ئۆممەتەکەت دەیکوژن، ئەگەر حەز دەکەی ئەو خاکەت نیشان دەدەم کە لە سەری دەکوژرێ، کە تەماشای کرد ئەمە ناوچەیەکە (کەربەلا)ی پێ دەوترێ،[١] ئەمەو دوای تێپەڕینی سالآنێکی دووروودرێژ ئەمە بەو شێوەیە ڕوویدا، ئەم هەواڵەی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر ئاینده یەکێکە لەو موعجیزانەی دەبنە بەڵگە لەسەر پێغەمبەرایەتی ئەوو، دەری دەخەن کە ئەو بە شێوەیەکی هەقو ڕاستو دروست ڕەوانەکراوی خودایە، هەڵبەتە پێغەمبەر (ﷺ) ئەم هەواڵانەی لە ڕێگای وەحیەوە ڕاگەیاندوون.[٢]

## حەوتەم: تۆڵەسەندنەوەی خودا لە بکوژانی حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت):

خودای گەورە -بەبەرچاوی خەڵك- تۆڵەی دونیایی لە بکوژانی حوسێنی شەهید (ڕەزای خوای لێ بێت) لە سەرووی هەموویشیانەوە عبیدالله ی کوڕی زیادو، یەزیدی کوڕی معاویەو هەموو ئەوانەی بەشداری کوشتنی ئەویان کردبوو سەندەوەو، هیچ کامێك لە ئەوان بە سەلامەتی بۆی دەرنەچوون، هەرچی عوبەیدوڵلا بوو، ئیبراهیمی کوڕی ئەشتەر کوشتیو، سەری لە لاشەی جیاکردەوەو، بەرەو لای موختاری کوڕی أبی عبدالله ی سەقەفی ڕەوانەکرد، إبن عبدالبر دەڵێ: حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) لە ڕۆژی یەك شەممە ١٠/محرم/٦١ی کۆچیدا کوژرا،...ئەزقەزا عبیدالله ی کوڕی زیادیش لە ڕۆژی عاشوراو واتە ١٠/محرم/٦٨ی کۆچیدا کوژرا، ئیبراهیمی کوڕی ئەشتەر لە گۆڕەپانی جەنگدا کوشتیو سەرەکەی بۆ لای موختار ڕەوانە کرد، موختاریش بۆ لای عبدالله ی کوڕی زوبێری نارد، ئەویش بۆ لای عەلی کوڕی حوسێنی بەرێکرد.[٣] لە ڕیوایەتەکەی (عماری کوڕی عمیر)دا چەسپاوە کە وتوویەتی: کەللەسەری عبیدالله ی کوڕی زیادو ڕەفیقەکانی هێنران، هاتین بۆ لایان، ئەوان دەیانگوت: هات، هات. بینیمان مارێك بەنێو سەرەکاندا پێچ دەخوات، هات تا خۆی بە کونە لووتی عبیدالله دا کرد، پێچێك لەوێدا مایەوە، ئەمجا دەرچوو و بزر بوو، ئەمجا وتیان: ئەوە هات، ئەوە هات، ئیتر دوو جار یان سێ جار ئەمەی کرد.[٤]

١ فضائل الصحابة (رقم: ١٣٩١)، بسند صحيح.
٢ سير الشهداء (ص: ٢٤٤).
٣ الاستيعاب حاشية الإصابة (٣٦٢/١).
٤ سير أعلام النبلاء (٥٤٩/٣).

بەڵام یەزیدی کوڕی معاویە بە هۆی کوژرانی حوسێنەوە لەبەر چاوو دڵ نەمابوو، خەڵك ڕقیان لێ دەبۆوەو چەندین کەس‌و تاقم شۆڕشیان لە دژی هەڵایساند، دانیشتوانی شاری مەدینەی نەبەوی لە دژی ڕاست بوونەوەو، دەرەنجام تاوانێکی تریشی تۆمار کرد کە بریتی بوو لە کارەساتەکەی (حوڕڕە)ی مەدینە، ئیتر خودا هیچی تری مۆڵەت نەداو دەوڵەتەکەی چوار ساڵی تەواو نەکرد مرد.[١] لە (أبو رجاء العطاردي)یەوە گێڕدراوەتەوە کە وتوویەتی: قسە بە عەلی‌و یەك کەس لە ئالوبەیت نەڵێن، لە (بلهجیم) دراوسێیەکمان هەبوو -کە لە کوفەوە هاتبوو- وتی: ئەوە ئەم فاسقی کوڕی فاسقە (حوسێنی کوڕی عەلی) نابینن کە خوا کوشتی؟ ، ئیدی خوای گەورە پێی نواند و دوو تیرە ئەستێرەی لە ئاسمانەوە تێگرتن‌و هەردووك چاوی کوێر کردن!.[٢]

(إبن كثير) وتی: زۆربەی ئەو وتەو ڕیوایەتانەی سەبارەت بەو بەڵاو موصیبەتگەلەی تووشی حوسێن هاتوون ڕاستەقینەن: چونکە کەم کەس لەو کەسانەی بەشداری کوشتنی حوسێنیان کردبوو بەبێ تووشبوون بە ئافەت‌و نەخۆشی دونیایی بۆی دەرچوون، هەریەکێکیان بە جۆرە نەخۆشیەکەوە گرفتار بوو، زۆربەشیان تووشی شێتی بوون.[٣]

## هەشتەم: هێزەکانی دژ بە ئیسلام‌و کارەساتی کەربەلا:

هێزەکانی دژ بە دەوڵەتی ئیسلام لە هێنانەدی ڕووداوەکەی کەربەلادا سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، ئەمجا دەرفەتێکی لەباریان دۆزیەوە بۆ پارچەپارچەکردنی جەماعەتی ئیسلامی‌و دووبەرەکی خستنە نێو موسڵمانانو، نەهێشتنی یەکدەنگی‌و یەکهەڵوێستی نێوانیان.

کوفە لەگەڵ ئەوەدا باشترین چینی خەڵکی لە هاوەڵان لەخۆگرتبوو بەڵام لە هەمان کاتیشدا ببوو بە مەڵبەندو لانەی خەڵکانی شازو خراپ‌و شەڕەنگێزو ئاشوبچی، چۆن هاوەڵان ڕوویان تێ کردبوو، جوولەکەو نەصرانیش دزەیان کردبووە ناویەوەو، چۆن عەرەبە ڕەوەندەکان هاتن‌و تێیدا نیشتەجێ بوون، خەڵکانی ناعەرەبیش هاتن‌و شاریان قەرەباڵغ کرد، جا لەوێدا کوفرو زندیق‌و سیحرو جادووبازی تەشەنەی سەند، تاقم تاقمێنەو حیزبحیزبێنەی دژ بەیەك سەریان هەڵدا، تاقمی جولەکە تەلمودیان بڵاو دەکردەوە،

---

١ الدوحة النبوية (ص: ١٢٩).

٢ المعجم الكبير للطبراني (١١٩/٣)، ورجاله رجال صحيح.

٣ البداية والنهاية، نقلا عن الدوحة النبوية (ص: ١٢٩).

نەصرانیەکان بانگەشەیان بۆ بەرجەستەیی ئولوهییەت دەکردو، سەرانی کۆمەڵە نهێنیەکانیان لەگەڵ تاقمە خۆتێهەڵقورتێنە پەنهانەکانیان سەریان تێکناو بابەتی خوێنی حوسێنیان قۆستەوەو، وایان دەخستەڕوو کە خوێنی مەسیح بە لای نەصرانیەکانەوە چەند بە نەرخو گرنگە، خوێنی حوسێنیش هەروایە، ئەمەو بە حوکمی ئەوە حوسێن کاتی خۆی ببوو بە زاوای فارسەکانو ببوو بە شووی (جیهانشا)ی کچی (یەزدجرد) عەلی کوڕی لە ئەو کەوتبۆوە، بەڵێ نەصرانیەکان لەم ڕێگایەوە خۆیان بەنێو دەروونی فارسەکاندا کردو دەیانورووژاندنو هانیان دەدان لە دژی دەوڵەت شۆڕش بکەن.[١]

کارەساتەکەیان هێندە گەورە کرد، تا هێنایانە ڕیزی ئەو موصیبەتانەی بەسەر پێغەمبەردا هاتوون.[٢] ئیتر لە میانەی ئەمەدا بیروبۆچوونی ئەهلی کیتاب بە ئاسانی دزەی کردە نێو دڵو دەروونیانەوەو، وایان دانا کە حوسێن بە هۆی ئەو کارەساتەی بەسەر خۆیو کەسوکارەکەیدا هاتووە لە کوشتنو ئازاردان، ئازار ناچێژێ، بەڵکو بۆ ئەوە ئازار دەچێژێ کە ئوممەتی باپیری کە ئێستا ئەو ئیمامو پێشەوایەتی بە هۆی ئەو شەڕەی لە دژی ئەوی بەرپاکردووە گومرابووە،[٣] ئەمە بیروبڕوای نەصرانیەکانمان سەبارەت بە لە خاچدانو ئازاردانی مەسیح دەخاتەوە یاد، لەو دەمەدا بە لای ئەهلی کیتابەوە ئاسان بوو تۆوی بیروبۆچوونێکی ئاوا لە دڵو دەروونی خەڵکانی تازە موسڵمان بچێنن، ئیدی ناعەرەبەکان-ی کوفە- بە لێشاو دەبوون بە شیعەو حوسێنیان وەك مرۆڤێکی ڕووحانی تەماشا دەکردو، پێیان وابوو خودا لە ئەزەلەوە ئەوەی لە چارە نووسیووە کە بە گیانیو جەستەییو خوێنی خۆی خۆی گیانفیدای ئیسلام بکاتو بیپارێزێت، ئیتر مەسیحی دڵسۆز چ ڕۆڵێکی خۆبەختانەو پێشمەرگانەی -بۆ پاراستنی نەصرانیەت- گێڕابوو بە هەمان شێوە حوسێنیش هەمان ڕۆڵی بۆ پاراستنی ئیسلام گێڕاوە،[٤] بێ شك کە ڕاوێژکارە نەصرانیەکانی یەزیدیش کە (سرجون) یەکێك بوو لەوان، کاریگەریان لەسەر تۆمارکردنی ئەو کارەساتە مەرگبارو خوێناویانەو هەموو ئەو بەڵاو ئاژاوانەی لێیانەوە کەوتنەوە هەبووە.[٥]

---

١ فرق الشيعة (ص: ٥٣)، الطبقات (١٥٦/٥).

٢ أثر أهل الكتاب في الفتن والحروب الأهلية (ص: ٤٩١)، تأريخ الامامية وأسلافهم من الشيعة (ص: ٥٤).

٣ أثر أهل الكتاب في الفتن والحروب الأهلية (ص: ٤٩٢).

٤ المصدر نفسه (ص: ٤٩٤).

٥ المصدر نفسه (ص: ٤٩٤).

## نۆیەم: شەهیدکرانی حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) یەك خاڵی وەرچەرخان بوو لە مێژووی بیروباوەڕی شیعەگەرایيدا:

شەهیدبوونی حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) بە گەورەترین خاڵی وەرچەرخانی مێژووی بیروباوەڕی شیعەو شیعەگەرایی دادەنرێ، کاریگەری ئەم کارەساتە دڵتەزێنە هەر لەسەر خۆشکردنی بڵێسەی شیعەگەرێتی لە دڵو دەروونی شیعەکانداو یەکخستنی ڕیزەکانیان کورت هەڵنەهاتو بەس، بەڵکو گرنگی ئەم کارەساتە لەوەدا دەرکەوت، کە شیعەگەری بەر لە کوژرانی حوسێن تەنها ڕایەکی سیاسی بوو، لە لایان نەببوو بە بیروباوەڕو عەقیدە، جا کاتێك حوسێن کوژرا شیعەگەری لەگەڵ گۆشتو خوێنیان ئاوێتە بوو، خۆی بەنێوەندی دڵدا کردن و ئیتر بوو بە غەقیدەو بیروباوەڕو ڕەگی لە دەروونندا داکوتان.[1] شیعەکان تەماشایان کرد شەهیدبوونی حوسێن لە شەهیدبوونی خودی عەلی کوڕی ئەبی طالب-ی باوکیشی- گرنگترە!، چونکە حوسێن کوڕی کچی پێغەمبەری خودایە (ﷺ)[2]. ئەمەو نەتەوەی فارس بیروباوەڕی شیعایەتی قبوڵ کردو، بەمەش بیروباوەڕو شیعەچێتیەکەیان لە دەورەی حوسێن و نەوەکانی، -بێ حەسەن و نەوەکانی- چڕکردەوە، پێیان وابوو مافی پۆستی خیلافەت و ئیمامەت بۆ حوسێن و نەوەکانی مافێکی خوداییەو، ئەم مافەش بە دەق چەسپاوە نەك بە هەڵبژاردن و سەرپشککردن.[3] بەڵکو شیعە پێیان وایە ڕژانی خوێنی حوسێن لە دەشتی کەربەلادا لە بواری خۆبەختکردندا بەهایەکی تایبەتداری هەیەو، کتومت بەو خوێنە دەچێ کە نصرانیەکان پێیان وایە مەسیح ڕشتوویەتی.[4] ئیدی دوابەدوای کوژرانی حوسێن لێکجیایی عەقیدەو بیروباوەڕ تەنها لەسەر ئەهلی سوننەت و شیعەدا کورت هەڵنەهات، بەڵکو کوژرانی حوسێن کاریگەری لەسەر خودی شیعەکان داناو، لەنێو خۆیاندا بوون بە چەند تاقمو بەش.[5] ئەمەو بە خاتری بە گرنگ و گەورە دانانی کوژرانی حوسێن، شیعەکان هەستان

---

١ نظرية الإمامة (ص: ٤٧)، مواقف المعارضة (ص: ٣٣٨).
٢ الخوارج والشيعة (ص: ١٨٨)، فلهاوزن، مواقف المعارضة (ص: ٣٣٩).
٣ الوثائق السياسية للجزيرة العربية (ص: ١٩، ٢٠).
٤ مواقف المعارضة (ص: ٣٣٩)، التأريخ السياسي، عبدالمنعم ماجد (٢/٧٧).
٥ فرق الشيعة (ص: ٢٣)، للنوبختي، مواقف المعارضة (ص: ٣٣٩).

جەختیان لەسەر گرنگی ڕۆژی عاشوڕا کردەوە، چەندین جۆر هونەریان بۆ دەرخستنی دڵتەنگی لەو ڕۆژەدا خستەگەڕو، حەدیسی بێشوماریان لەسەر گەورەیی ئەو ڕۆژە هەڵبەستن، وایان دانا کە گریان بۆ حوسێن لە ڕۆژی عاشوڕادا هەموو گوناهێکی کە لە پێشدا کرابێ دەسڕێتەوە، ئاهەنگی ماتەمینی عاشوڕایان کرد بە واجبێکی دینی‌و، دەبێ حوکمڕانیان‌و خەڵکی بە گشتی وەکو یەك تێیدا ئامادە بن‌و هەست‌و سۆزو پەرۆشی‌و دڵتەنگی خۆیان لەو ڕۆژە خەفەتبارەدا دەرببڕن‌و بخەنەڕوو،[1] بەڵی دامەزرێنەرانی بیروباوەڕی شیعەگەرێتی ویستوویانەو دەیانەوێ جەخت لەسەر ڕۆژی عاشوڕا بکەنەوەو[2] شیعایەتیش بکەن بە بیروباوەڕێکی چراناساو هەمیشە لەنێو سینەی شوێنکەوتووەکانیاندا بهایسێ‌و بسوتێ. دەوڵەتەکانیان وەك دەوڵەتی بوەیهی لە عێراق‌و دەوڵەتی عەبیدی فاطیمی لە میصر زۆریان بایەخ بەم لایەنە —واتە زیندووکردنی یادی عاشوڕا— دەدا.[3] لە کتێبی (علي بن أبي طالب)دا (ڕەزای خوای لێ بێت) کەمێك بە درێژی باسی بیروباوەڕی شیعەم کردووە.

## دەیەم: نموونەیەك لە پاڕانەوەی حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت):

حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) بەر لە دەستپێکرانی جەنگ بەم چەشنە پاڕایەوە: خودایە تۆ لە هەموو ناگوزوریەکدا جێی متانەی منی، لە هەموو تەنگانەیەکدا هومێدی منی، لە هەر کاتێکدا شتێکم بەسەردێ تۆ جێ متمانەو هێزو وزەی دەسەڵاتی منی، چەندین پەژارەو تەنگانە هەبووە دڵ تێیدا لاواز بووە، فێڵی تێدا دەربازبوونی کەم بووە، هاوڕێگەلی تێدا بەزیوە، بە خۆشی‌و شادی دەروونی دوژمن بووە، لەو دەمەدا سکاڵای خۆم بۆ لای تۆ هێناوەو، حەزم لێبووە تەنها تۆ ڕزگارم بکەی، یەکسەر لەسەرمت لابردووەو، دەرووی خێرت لێ کردوومەوە، ئەی خودایە تۆ خێوی هەموو نازو نیعمەتێکی، خاوەنی هەموو چاکەیەکی، دوا مەنزڵی هەموو حەزێکی.[4] حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) جوانترین شێوازی پاڕانەوەو پەنابردنەبەر خودای باڵادەست‌و متمانەو پشت بەستن‌و چوونی بەرەو ئەو زاتە گەورەمان

---

١ إيران في ظل الاسلام، عبدالمنعم حسنين (ص: ١٠٤)، مواقف المعارضة (ص: ٣٢٩).

٢ مواقف المعارضة (ص: ٣٤٠).

٣ مواقف المعارضة (ص: ٣٤٠).

٤ تأريخ الطبري (٦/٣٥٠).

فێر دەکات، چۆن وانەبێ کە باپیرەی (ﷺ) دەفەرموویێت: ((لیس شيء أكرم على الله من الدعاء))[1] واتە: بە لای خوداوە هیچ شتێك بە ئەندازەی پاڕانەوە بەنرخ نیە. بێگومان حوسێن لە ئامۆژگاریو ڕێنماییەکانی باپیری (ﷺ) فێر بووە کە: یارمەتی خواستنو سکاڵاو هانابردن تەنها دەبێ بۆ خودا بێو بەس، کەواتە مرۆڤ جگە لە (ألله) نابێ تەوەکولی لەسەر هیچ شتێکی تر لە پێغەمبەرو ئیمامو وەلیو پیاوی چاك هەبێ پشتی پێ ببەستێتو هانای بۆ بەرێتو هاواری لێ بکات، حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) فێرمان دەکات دەبێ مرۆڤ لە پاڕانەوەو لالآنەوەدا تەنها ڕوو لە (ألله) بکاتو ڕوو لە هەموو شتێکی تر وەرگێڕێ، ئا ئەمە حوسێنەو لەم هەڵوێستە سەختو دژوارەدا کە ماڵئاوایی لە ژیان دەکات. هاواری لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) یان عەلی باوکی نەبەست، بەڵکو بەس هاواری لە خودا بەستو تکای لە ئەو کرد، لێرەدا حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) بەرنامەیەکمان فێردەکات کە پێویستە بە موو لێی لانەدەین، کە کاتێك مرۆڤ لە کاتی دووعاکردندا پێویستی بە شتێك بوو، یان داوای ڕزقو ڕۆزیو شیفای نەخۆشیو شتێك لەم بابەتانەی کرد، لەسەری پێویستە تەنها لە خودا بپاڕێتەوەو یەك کەسیش نەکاتە هاوبەشی خودا جا ئەو کەسە با لەوپەڕی شکۆداریشدا بێ هەر نابێ.[2]

جا هەر کەسێك حوسێنی خۆش دەوێ، پێویستە وەك حوسێن بکاتو بە تەنها هەر لە خودا بپاڕێتەوەو، نەڵێ یاحوسێن یان یا عەلی، بێگومان هاوار بەستن لە دروستکراوان لادانێکی گەورەیە لە قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەری خودا (ﷺ)و شەقامی هیدایەتی زانایانی سەرڕاست، لە سەرووی هەموویانەوە ئیمامانی ئالوبەیتی پاكو چاك، شاعیر دەڵێ:

وأفنيـة الملـوك محجبـات ... وبـاب الله مبذول الفناء

فما أرجو سواه لكشف ضُري ... ولا أفزع إلى غـير الدعاء[3]

---

١ سنن الترمذي رقم (٣٣٧٠)، صححه الالباني في صحيح الجامع.

٢ الحسين بن علي بين الحقائق والأوهام، عبدالرحمن بن عبدالله جميعان (ص: ٥٦).

٣ الأخلاق (ص: ٣٨).

## باسی چوارەم
## ڕووداوی (الحرة)، ٦٣ك

شۆڕشی مەدینەو ڕاپەڕینیان لە دژی حکومەتی ئومەویو خیلافەتی یەزیدی کوڕی معاویە بریتی بوو لە درێژبوونەوەی سروشتی بزوتنەوە بەرهەڵستکاریەکەی عبداللە ی کوڕی زوبێر کە لە مەککە دەستی پێ کردبوو، نزیکبوونی سەردەمی یەزیدی کوڕی معاویە (٦٠ك) لە سەردەمی خیلافەتی ڕاشیدەوە، هۆکارێکی تر بوو بۆ ئەوە کوڕانی هاوەڵان زیاتر حەزیان لە وەبێ سیستەمی شوڕا بۆ حکومڕانی بگێڕنەوەو لەنێو خەڵکدا پیادەی بکەن، کاتێکیش حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) بە خۆیو براو ئامۆزاکانیو هاوەڵانی لەسەر دەستی عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد بەم شێوە دڕندانەو ناجوامێرانە کوژران، زۆرێك لە کوڕانی هاوەڵان هەستیان بە گەورەیی قەبارەی ئەو خۆسەپاندنە کرد کە دەوڵەت لە میانەی حوکمڕانیدا پەیڕەوی لێ دەکات، ئەمە وای لە خەڵکی حیجاز کرد هاوسۆزیو هەواداری خۆیان بۆ عبداللەی کوڕی زوبێر (ڕەزای خوای لێ بێت) نیشان بدەن کە دروشمی شوڕای بەرز کردبۆوە. لە هەمان کاتیشدا یەزید هەڵنەستا (عبیداللە ی کوڕی زیاد) –وەکو یەکێك لە بەرپرسە ڕاستەوخۆکانی ئەو تاوانە گەورەی لە کەربەلا بەسەر حوسێنو کەسوکاریدا هێنرا– دادگایی بکات، خەڵك ئەم هەڵوێستەیان بە خۆشەویستی لە قەڵەمدا بۆ عبیداللە ی کوڕی زیاد لە لایەن یەزیدی کوڕی معاویەی ئامۆزایەوە.[1] هیچ گومانی تێدا نیە کە کوژرانی حوسێنو هاوڕێیانی بەم شێوە دڕندانەیەو ستاندنی گیانی ئازیزێکی ئاوا دەروونی خەڵکی بە تێکڕایی هەژاندو، خەمو پەژارەو پەرۆشیەکی لە ڕادەبەدەری بۆ دروست کردن.[2]

### یەکەم: وەفدی مەدینە لە دیمەشق سەردانی یەزید دەکات:

عثمانی کوڕی محمدی کوڕی أبي سفیانی والی مەدینە دەیەویست خەڵکی مەدینە بکاتە هەوادارو لایەنگری یەزیدی کوڕی معاویە، چەند کەسایەتیەکی لێ هەڵبژاردنو بە وەفد بەرەو دیمەشقی ڕەوانە کردن، یەزید بە شێوەیەکی شایستە پێشوازیو بە خێراتنی لێ کردنو میواندارییەکی باشی بۆ ڕێك خستنو ڕێزی لێ گرتنو خەلاتی کردن، لەنێو وەفدەکەدا: عبداللە ی کوڕی غەسیلی ئەنصاریو، عبداللە ی کوڕی عمروی کوڕی حەفصی موغیرەی خەزرەمیو، مونذیری کوڕی زوبێرو، ژمارەیەکی زۆرو بەرچاو لە پیاوماقوڵانی شاری مەدینە دەبینران،

---

١ مواقف المعارضة (ص: ٣٦١).

٢ مواقف المعارضة (ص: ٣٦٢).

پـاش وەرگرتنـی دیاریـەکانیان بـەرەو مەدینـە گەڕانەوە،هـەر دوای ئەمـە دەسـتیان بـە ڕەخنـەگرتن لـە یەزیـد و نـەفرینکردنی کـرد، دوژمنایـەتی خۆیـان بـۆ دەرخـستو لـە لایـەن خۆیانەوە لە پۆستی خیلافەتیان خست.[1] ئیتر دانیشتوانی مەدینە ڕاپـەڕینو عثمـانی کـوڕی محمدی والیان لە شار بەدەرناو، هەروەك چۆن مـەڕوانی کـوڕی حەکـەمو تـەواوی ئەنـدامانی بنەماڵەی (ئومەوی)یـشیان دەرکـردن، ئـەم هەواڵـە بـە یەزیـد گەیـشتو بـۆی دەرکـەوت کـە خەڵکی مەدینە بەیعەتەکەی ئەویان ڕەت کردۆتەوەو لێیان خستووەو، لایان بە لای عبدالله ی کـوڕی زوبێـردا کـردووە، بۆیـە بـە پەلـەو بـێ دواکـەوتن بـە ئامـانجی داگیرکردنـی مەدینـە سوپایەکی بە فەرماندەیی (موسلیمی کوڕی عوقبەی کوڕی موڕی) ساز کرد.[2]

## دووەم: هەڵوێستی زانایانی مەدینە لە دژی دەرچوونو ڕا پەڕین:

١ـ عبدالله ی کوڕی عمر (ڕەزای خوای لێ بێت):

ژمارەیەك زانای (مەدینە) لە بەرانبەر لێخستنی یەزیدو لە دژ دەرچوونی نـاڕەزابوونو بـە هیچ شێوەیەك لەگەڵ ئەم هەڵوێستەیاندا نەبوون، بۆیە خۆیان لە ئاشوبو هەرا لایـەڕ گـرتو بە ڕاستو چەپدا دەستیان بە ئامۆژگاری کردنی برا –موسڵمانەکانیان– دەکرد کە ئەم کارە نەکەن، ئەوانەی لەسەر ئەم ڕایە بوون زۆرینەیان شەرعزان بوونو لە پێشەوەی هەموویانەوە زانای پایەدارو ئیمامی پێشەنگ عبدالله ی کوڕی عمری کوڕی خطاب (ڕەزای خوایان لێ بێـت) دەبینـرا، ئـەو نـاڕەزایی تونـدی ئاراسـتەی ئەوانـە دەکـرد کـە بەیعەتەکـەی یەزیـدیان ڕەت دەکردەوەو هەوڵیان دەدا لە پۆستی خیلافەتی دابەزێنن.[3] جا کاتێك عبـداللەی کـوڕی مطیـع ویستی لەبەر بەیعەتدان لە یەزید ڕاکاتو مەدینە بەجێ بێڵـێ، عبـدالله ی کـوڕی عمـر ئەمـەی بیستو بە دوای کەوت هەتا لە دەرەوەی شار پێی گەیشتو پێی وت: ئـامۆزای خـۆم بـەرەو کوێ دەچی؟ وتی: هەرگیز دەستی پەیمانی گوێڕایەڵیو فەرمانبـەرداریيان پـێ نـادەم. پێـی وتـەوە: ئـەی ئـامۆزا بـەرەو کـوێ دەچـی؟ ئـەم کـارە نەکـەی، مـن گـەواهی دەدەم کـە لـە پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) بیـستووە، کـە دەیفـەرموو: ((مـن مـات ولا بيعـة عليـه مـات ميتـة جاهلية))[4] واتە: هەر کەسـێك بمـرێ بەیعـەتی هـیچ ئیمـامێکی لەسـەر نـەبێ، بـە شـێوەیەکی نەفامانە دەمرێ. کاتێك دانیشتوانی مەدینە یەزیدیان لـە خیلافـەت خـست، عبـدالله ی کـوڕی

---

١ البداية والنهاية (١١/٦٢٤، ٦٢٥).

٢ تأريخ خليفة (ص: ٢٣٧)، أثر العلماء في الحياة السياسية (ص: ٥٠٤).

٣ أثر العلماء في الحياة السياسية والدولة الأموية (ص: ٥٠٦).

٤ مسلم، ك: الامارة (٣/١٤٧٨)، سير أعلام النبلاء (٣/٣٢٣).

عمر ڕۆڵەو کەسوکارو لایەنگرانی خۆی کۆکردنەوەو وتی: من گوێم لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بوو، دەیفەرموو: ((ینصب لکل غادر لواء یوم القیامة)) واتە: هەموو پەیمانشکێنێك لە قیامەتدا ئاڵایەکی بۆ هەڵدەدرێت، ئەوا ئێمە لەسەر دەستی خوداو پێغەمبەرەکەی بەیعەتمان بەو پیاوە داوە، من پێم وا نیە هیچ جۆرە پەیمانشکێنیەك لەوە گەورەتر بێت، کەسێك لە پێشداو لەسەر دەستی خوداو پێغەمبەرەکەی تۆقەی بەیعەتی لەگەڵ بکرێت‌و ئەمجا سەنگەری جەنگی لە بەرامبەردا بەرز بکرێتەوە، من بزانم هەر کەسێك لە ئێوە لێی بخات، یان بە دوای ئەم کارە بکەوێ، ئەوا نێوانم لەگەڵی تێك دەچێ.[1] عبدالله ی کوڕی عمر لەبەر دوو هۆ بەرهەڵستی خەڵکی ڕاپەڕیوی مەدینەی دەکرد:

یەکەم: هەڵوەشاندنەوەی بەیعەت دوای بەسترانی:

ئەو تەماشای دەکرد ئەوان بەوپەڕی ئازادانەو ڕەزامەندی دڵ‌و دەروونی خۆیان بەیعەتیان داوە، ئەوان کارێکی وەك حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت)یان نەکرد، کە ئەو هەر لە سەرەتاوە هەڵوێستی ڕوون‌و ئاشکرا بوو، بەیعەتی نەدا، بۆیە ئەمەی ئێستا خەڵکی مەدینە دەیکەن، بە لای عبدالله ی کوڕی عومەرەوە غەدرو خیانەتە، کاتێك ڕووی قسە دەکاتە عبداللەی کوڕی مطیع ئەمە دەردەکەوێت، ئەو بە عبدالله ی وت: من گوێم لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بوو دەیفەرموو: ((من خلع یداً من طاعة لقي الله یوم القیامة ولا حجة له، ومن مات ولیس في عنقه بیعة مات میتة جاهلیة))[2] واتە: هەر کەسێك دەستی خۆی لە فەرمانبەرداریەك بکێشێتەوەو لە قیامەتدا بگاتەوە بە خودا بێ بەڵگەو پاساو دەکەوێتە گۆڕێ، هەر کەسێك مردو هیچ بەیعەتێکی لە ئەستۆدا نەبوو، ئەوا بە شێوەیەکی نەفامانە دەمرێ. ئەمەی (عبدالله ی کوڕی عمر) لەسەر کەسوکارەکەی خۆی واجب کرد لە بەرانبەر بەیعەتەکەی یەزیددا وەفادار بن‌و ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خودا (ﷺ)ی بەبیر هێناوە کە دەفەرموێت: ((ینصب لکل غادر لواء یوم القیامة)) واتە: پەیمانشکێن لە دواڕۆژدا بەیداخ–ی ناپاکی– لە ژوور سەری هەڵدەدرێ، ئەمجا پێی وتن: ئێمە پێشدا بەیعەتمان بەو پیاوە داوە، نازانم هیچ پەیمانشکێنیەك لەوە گەورەتر بێ، یەکێك لەسەر دەستی خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بەیعەتی پێ بدرێت‌و پاشان تەپڵی جەنگی بۆ بکوترێت.[3]

---

١ مسلم، كتاب الامارة (١٤٧٨/٣).

٢ البخاري، كتاب الفتن، باب: (٢١).

٣ الفقهاء والخلفاء (ص: ٦٠).

دووەم: بە گەورە دانانی خوێنی موسڵمانانو گەورەیی حەڕامبوونی کوشتار لەنێوانیاندا:

ئەم حەڕامبوونە لە شوێنە پیرۆزەکانی وەکو مەککەو مەدینەدا زیاترو زیاتر دەبێ، (إبن حجر) هاتووە ئەم هەڵوێستەی عبداللە ی کوڕی عمرو ئەو حەدیسانەی ڕابوردنی کردوونەتە بەڵگە لەسەر واجب بوونی گوێڕایەڵیو فەرمانبەرداری بۆ ئیمامێك کە بەیعەتی بۆ بەسترابێو قەدەغەبوونی دەرچوونو ئەنجامدانی شۆڕش لە دژی، ئەگەر لە میانەی حوکومەتداریەکەشیدا ستەم بکات، چونکە بە فیسق لێ ناخرێت.[1] لە ڕاستیدا ئەم هەڵوێستەی ئیبنو عومەر نە دەبێتە بەڵگە بۆ جائیزبوونی بەیعەتدان بە سەرۆکی دەوڵەتی فاسقو ستەمکار، نە دەبێتە پاساو بۆ قەدەغەبوونی لێخرانی بە هۆی ئەو لادانو ستەمەی ئەنجامی دەدات، بەڵکو بە تەنها بەڵگەیە بۆ قەدەغەبوونی پەیمان شکاندن بە هەموو شێوەکانیەوەو لە هەموو بابەتەکانیەوە، کە لە نێوانیاندا غەدرو پەیمانشکێن ئوممەت لەخۆ دەگرێ لە بەرانبەر سەرۆکێکدا کە بە ڕەزامەندی دەروونی خۆی تۆقەی بەیعەتی لەگەڵ کردووەو دەنگی بۆ داوە،[2] ئەمە وەکو ئەوە وایە زمانحاڵی عبداللە ی کوڕی عومەر ئەمە بڵێ: ئەگەر دەتانزانی یەزید لادانو ستەمی هەیە، ئەی باشە بۆ لە سەرەتادا بەیعەتتان پێ داو منیشتان لەگەڵ خۆتان ڕاداو، واتان لێ کردم بەیعەتی پێ بدەم؟ چونکە زانراوە کە هەتا هەموو خەڵکی مەدینە بەیعەتی نەدا عبداللە ی کوڕی عمر بەیعەتی نەدا، ئێستاش کە بەیعەتتان پێ داوە، ئەوا بەیعەتی ئەوتان لە گەردن دایەو دەبێ پێیەوە پابەند بن، لە لایەکی ترەوە عبداللە ی کوڕی عمر گومانی لەسەر هەموو ئەو قسەو قسەڵۆکانە هەبوو کە لە نێو خەڵکدا دەوتران، کە یەزید فاسقە، هەر ئەو لەم گومانەدا نەدەژیا، بەڵکو محمدی کوڕی حەنەفییەش لاموجیمی خەڵکەکەی دەکرد کاتێك دەیانوت: یەزید نوێژ ناکاتوەمەی دەخواتەوە،[3] لەوانەیە ئیبنو عومەر لەم بوارەدا خۆپارێزی کردبێ لەوە کەسێك تۆمەت بخرێتە پاڵ دینداریيەکەی، مادام ئەمە بە لای ئەوەوە نەگەیشتۆتە پلەی یەقینو دڵنیایی، ئەمەو ئەو لەگەڵ ئەوەدا لەسەر بەیعەتەکەی خۆی مایەوە، بەڵام خۆی لاپەڕ گرتو لە شەڕەکەدا بەشداری هیچ لایەنێکی نەکرد،[4] ئا ئەمەی ڕابوری هەڵوێستی مامۆستاو چاوساغی یارانی پێغەمبەری سەردەمی خۆی بوو، لە هەر هەمووان خۆپارێزترو دنیانەویستتر بوو، لە بواری شەرعو دینی

[1] فتح الباري (١٣/٦٠).

[2] الفقهاء والخلفاء (ص: ٦٠).

[3] الفقهاء والخلفاء (ص: ٦٠).

[4] الفقهاء والخلفاء (ص: ٦١).

خوداشدا لە هەموویان شارەزاتر بوو، پێغەمبەری خوداش (ﷺ) شایەدی چاکی‌و پاکی‌و تەقوای بۆ دابوو.[١] عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەربارەی دەڵێ: کەسم نەبینیوە بە قەد عبدالله ی کوڕی عمر پابەندی ئەنجامدانی یەکەمین کارو فەرمان بێ.[٢] سعیدی کوڕی موسەییەب دەربارەی دەڵێ: ئەگەر شایەتیم بۆ کەسێك دابایە کە بەهەشتییە، ئەوا شایەتیم بۆ عبدالله ی کوڕی عمر دەدا.[٣] علی کوڕی حوسێنیش دەربارەی دەڵێ: ئیبنو عومەر لە هەموو خەڵك دنیانەویستترەو ڕاوبۆچوونیشی لە هی هەموو کەس ڕاستەو دروستترو ئامانج هەنگێوترە.[٤] مالیك سەبارەت بە ئەو وتوویەتی: ئیبنو عومەر لە دوای پێغەمبەر (ﷺ) شەست ساڵ ژیا، لە کاتی وەرزەکانی پەرستندا فتوای بۆ خەڵك دەدا، ئەو یەکێك بوو لە ئیمامانی دین.[٥]

٢ـ محمدی کوڕی علي أبي طالب (إبن الحنفیة) (ڕەزای خوای لێ بێت): ڕای لەسەرنەبوو خەڵکی مەدینە لە دژی یەزید دەربچێتو، وەڵامی بانگەشەکەی نەدانەوەو لەگەڵیان دەرنەچوو، بەڵکو سەبارەت بەو تۆمەتانە دەیاندانە پاڵ یەزید ، مشتومڕی لەگەڵ کردن، کاتێك وەفدەکەی مەدینە لە لای یەزید گەڕانەوەو گەیشتنەوە مەدینە، عبداللهی کوڕی مطیع‌و هاوڕێکانی چوونە لای محمدی کوڕی حنفیە، ویستیان واداری بکەن یەزید لێ بخات، بەڵام بە قسەی نەکردن، لێرەدا عبدالله ی کوڕی مطیع وتی: یەزید مەی دەخواتەوە، نوێژ ناکات، سنووری حوکمەکانی قورئان دەبەزێنێ، محمد پێی وتن: ئەوەی ئێوە دەیڵێن من بە ئەومەوە نەدیوە، چوومەلای‌و لە لای ماومەوەو بینیومە کە لەسەر ئەنجامدانی نوێژەکان سوورەو، بە دوای خێرو چاکەدا دەگەڕێ‌و، پرسیار لە بابەتەکانی فیقهو شەرع دەکاتو، بە سوننەتەوە پابەندە، وتیان: ئەمەی بۆ بەرچاوی تۆ ئەنجامداوە تا تۆ وای بناسی، وتی: باشە هومێدی بە چ شتێکی منە، یان لە چ شتێکی من مەترسی هەیە تا گەردنکەچی‌و خۆ بەکەمزانی خۆیم نیشان بدا؟ ئایا پیشانیدان کە مەی دەخواتەوە؟ خۆئەگەر لە کاتی خواردنەوەکەدا لە لای بووین، ئەوا ئێوەش هاوبەشی ئەو بوون، ئەگەر بە چاوی خۆشتان نەتانبینیوە، بۆتان حەڵاڵ نیە شایەدی لەسەر شتێك بدەن کە بە چاوی خۆتان نەتانبینیبێ، وتیان: ئەوە بە لای ئێمەوە ڕاستەقینەیە، با نەشمانبینیبێ دەخواتەوە، پێی وتن: خودا ئەم

---

١ مسلم (١٩٢٧/٤)، رقم (٢٤٧٨).

٢ المستدرك للحاكم (٥٥٩/٣).

٣ المستدرك (٥٥٩/٣)، فضائل الصحابة (٨٩٥/٢)، رقم (١٧٠٣).

٤ المستدرك (١٦/٣).

٥ طبقات الفقهاء للشیرازي (ص: ٥٠)، مواقف المعارضة (ص: ٤٥٧).

جۆرە شایەتیدانە لە شایەتدەران قبوڵ ناکاتو دەفەرموویّت: ﴿إِلَّا مَن شَهِدَ بِٱلۡحَقِّ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ﴾[١] واتە: جگە لە کەسانێك کەبە هەق شایەتی بدەنو دەزانن ئەوەی بە زمان دەیڵێن لە دڵیاندا چەسپاوەو پێی شارەزان، کەواتە من هەقم بەسەر ئێوەو کارتانەوە نیە.[٢] وتیان: لەوانەیە حەز نەکەی جگە لە خۆت کەس سەرۆکایەتی بگرێتە دەست، ئێمە دەتکەین بە سەرۆکی خۆمان، وتی: نە بە سیفەتی پێشەنگو نە بە سیفەتی پاشەنگ جەنگو کوشتار لە دژی ئەو کەسە حەڵاڵ ناکەم کە ئێوە دەتانەوێ، وتیان: کاتی خۆی لە پشت باوکتەوە جەنگت کردووە، وتی: وێنەی باوکم بۆ بێنن تا لەسەر چ جەنگا لەسەر ئەوە جەنگ بکەم. وتیان: فەرمان بە کوڕەکانت أبو القاسم وقاسم بکە بێنە گەڵمانو جەنگ بکەن، وتی: ئەگەر فەرمانم بە ئەوان کردبایە بۆ خۆشم دەجەنگام، وتیان: دە هەستە وەرە لەگەڵمان بۆ شوێنێکی بەرزو خەڵك هاندە شۆڕش بکەنو بجەنگن، وتی: سبحان الله! فەرمان بە خەڵك بکەم شتێك ئەنجام بدەن بۆ خۆم حەزم لێی نەبێ، ئەگەر ئەمە بکەم، لەبەر خودا دڵسۆزیم بۆ بەندەکانی نەنواندووە، وتیان: کەواتە ناچارت دەکەین، وتی: ئەگەر وای لێهات منیش فەرمان بە خەڵك دەکەم پارێز لە خودا بکەنو، ڕەزامەندی خەڵك بە تووڕەبوونی خودا نەدەن. جا کاتێك محمدی کوڕی حەنەفییە تەماشای کرد ئاڕاستەی کاروبارەکان بەرەو شوێنێك دەڕوات کە ئەو نایەوێو، هەواڵی بەڕێکەوتنی سوپای شامیشی کەوتە بەر گوێو، زانی پاشەڕۆژێکی ڕەش چاوەڕێی بەرهەڵستکارانی مەدینە دەکات، لەبەر ئەمە بڕیاریدا مەدینە بەجێ بێڵێو، بەرەو مەککە بەڕێکەوت.[٣] ئیدی تەواوی ئەندامانی ئالوبەیت بەم ڕێگایەدا ڕۆیشتنو پابەند بوون بە فەرمانبەردارییەوەو، لەگەڵ دانیشتوانی مەدینە نەکەوتنو لە دژی یەزید دەرنەچوون، ئەمەو عەلی کوڕی حوسێنی کوڕی عەلی أبی طالب(زين العابدين) لەگەڵ خەڵکی ڕاپەڕیوی مەدینە نەکەوت، بەڵکو خۆی بە فەرمانبەرداریکردنی یەزیدەوە بەستەوە.[٤] ئەو (عەلی)یەی کە (الزهري) دەربارەی دەڵێ: ڕێزدارترین کەسی نێو بنەماڵەکەی بوو، لە هەموانیش گوێڕایەڵو فەرمانبەردارتر بوو، هەروەها وتوویەتی: نەگەیشتووم بە کەسێك لە ئالوبەیت لە عەلی کوڕی حوسێن مێرخاستر بووبێ.[٥] بە هەمان جۆر (عبدالله ی

---

١ الزخرف (٨٦).

٢ البداية والنهاية (١١/٦٥٤)، د. عبدالعزيز خان دەڵێ ئەم حەدیسە لە ڕێی (صخرى کوڕی جويرية)یەو ئەویش جێ متمانەیەو کەواتە سەنەدەکەی (صحيح)ەو لە (نافع)ەوە هێناویەتی/ أحداث وأحاديث (ص: ٣٠٣).

٣ البداية والنهاية (١١/٦٥٤).

٤ مواقف المعارضة (ص: ٤٥٨).

٥ تأريخ إبن عساكر (١٢/٣٥)، مواقف المعارضة (ص: ٤٥٨).

کوڕی عباس)یش کە کەڵەزاناو شەرعزانو قەڵەمی بە برشتی ئوممەت بوو، نەزانراوە پشتگیری ئەم هەڵوێستەی دانیشتوانی مەدینەی کردبێو، لێشی نەبیستراوە کە بەیعەتەکەی یەزیدی ڕەت کردبێتەوە، ئەمانەی ناومان هێنان لە سەردەمی خۆیاندا گەورەترین کەسایەتی نێو خانەوادەی پێغەمبەرایەتی بوون، لەگەڵ ئەمەشدا کە بەڵگەو پاساویان لە هەموو خەڵکێکی تر زیاتر پێ بوو بۆ ئەوەی ڕاببەڕنو لە دژی یەزید دەربچن، بەڵام ئارامیان گرتو بۆ ئەمە لەگەڵ خەڵکی مەدینە نەکەوتن.[١]

٣ـ نوعمانی کوڕی بەشیری ئەنصاری (ڕەزای خوای لێ بێت): ئەم هاوەڵە شکۆدارە یەکێك بوو لەو کەسانەی لە بەرانبەر ئەم هەڵوێستەی خەڵکی مەدینە ناڕەزا بوو، بە توندی ڕەخنەی لێ گرتن، ئەو کاتە دانیشتوانی مەدینە لە دژی یەزید ڕاست بوونەوە، نوعمان لە شام بوو، یەزید بوونی ئەوی لە شام بە هەل وەرگرتو، بە خاتری ئەوە نوعمان بتوانێ دایانبمرکێنێتەوەو بەرەو فەرمانبەرداریو هاتنەوەنێ ڕیزی جەماعەتی موسڵمانان بیانگێڕێتەوە، بەرەو مەدینەی بەڕێ کرد، نوعمان وەڵامی داواکاریەکەی یەزیدی دایەوەو، بەرەو مەدینە بەڕێ کەوت، کە گەیشت خەڵکی بە گشتی کۆکردەوەو فەرمانی پێ کردن کە گوێڕایەڵو فەرمانبەردار بنو بە جەماعەتی موسڵمانانەوە پابەند بن، مەترسی هەڵایسانی ئاگری ئاشوبو ئاژاوەشی بۆ خستنە ڕوو، پێی وتن: ئێوە توانانان بە خەڵکی شام ناشکێو پێیان ناوێرن. عبداللەی کوڕی مطیع وتی: هۆ نوعمان چ شتێك وات لێ دەکات کۆمەڵەکەمان پارچە پارچە بکەیو، ئەو کاروبارو ڕێکوپێکیە تێك بدەی کە خودا بۆی هێناوینە ئاراوە، نوعمان وتی: بەڵام بە خودا هەر دەڵێی چاوم لە تۆیە دەچیە نێو ئەو شتەی بانگەشەی بۆ دەکەی، پیاوان بە سواری دەکەونە نێو خەڵکەوەو بە شمشێر لە دەمو چاوو گەردنیان ڕادەکێشنو، سەرەگوریسی مەرگ لە نێوان هەردوولادا ئەمبەرەوبەر دەکات، دەبینم کە چۆن سواری ئێسترەکەت دەبیتو قەمچیەکی لەنێوچەوان ڕادەکێشیتو بەرەو مەککەی قاو دەدەیتو هەڵدێیو ئەو خەڵکە هەژارە[٢] بەجێ دەهێڵیتو لەنێو کۆڵانو جادەو مزگەوتو بەردەرگایماڵەکانی خۆیاندا دەکوژرێن!.

لێرەدا خەڵکی مەدینە سەرپێچی نوعمانیان کرد، بەو خوایە چۆنی وت ئاوا ڕوویدا.[٣]

---

١ مواقف المعارضة (ص: ٤٥٨).

٢ هەژارەکان: مەبەستی پێ لە ئەنصارەکانی مەدینە بوو.

٣ تأريخ الطبري، نقلا عن أثر العلماء في الحياة السياسية (ص: ٥١٣).

٤ـ عبداللەی کوڕی جعفری کوڕی أبی طالب (ڕەزای خوای لێ بێت): لەو دەمەدا یەزید بڕیاری دا سوپایەك بەرەو مەدینە بەڕێ بکات، عبداللەی کوڕی جعفەر لە شام بوو، لە پێناوی ئەوەدا شەڕو کوشتار لە خەڵکی مەدینە دوور بخاتەوە، هەوڵی دا خۆی لە ئەم ئیشە هەڵقورتێنێ، چوو بۆ لای یەزیدو داوای لێکرد بەزەیی پێدابێنەوەو، ئیدی وای لێ کرد تا نەرم بوو، عبدالله پێی وت: تۆ ئەگەر ئەمە بکەی خۆتیان پێ بە کوشت دەدەی، یەزید وەڵامی دایەوەو وتی: من یەکەم سوپای خۆم بەڕێ دەکەم، فەرمانیان بەسەردا دەدەم، لەڕێی مەدینەوە بەرەو جەنگی عبدالله ی کوڕی زوبێر بڕۆن، چونکە ئەو جەنگی لە دژ ڕاگەیاندووین‌و سەنگەری لە بەرانبەر گرتووین، ئەوان تەنها بەڕێگای مەدینەدا دەڕۆن‌و جەنگیان لەگەڵ ناکەن، جا ئەگەر خەڵکی مەدینە سەمعو تاعەیان نیشان دا ئەوا خۆیان تێناگەیەنن، بەم شێوەیە عبدالله ی کوڕی جعفر ڕێگایەکی دۆزیەوە بۆ ئەوەی شەڕو کوشتاری پێ لە خەڵکی مەدینە دوور بخاتەوە، بۆیە بە پەلەو بێ دواکەوتن نامەیەکی بۆ سەرانی مەدینە نووسی‌و هەواڵی پێی دان‌و دەیوت: ئەوەی ڕۆیشت ڕۆیشت، ساغ‌و سەلامەتی‌و ئاسایش بە دەرفەت وەربگرن، نەچن بەرەو ڕووی سەربازەکانی یەزید بوەستنەوە، لێیان گەڕێن با تێپەڕن‌و لێتان دوورکەونەوە،[1] ئەوانیش ئاوا وەڵامی عبداللەیان دایەوە: هەرگیز بەسەر ئێمەدا نایەنە ناویەوە[2].

٥ـ سعیدی کوڕی موسەییەب (ڕەحمەتی خوای لێ بێ): ئەویش لە بەرانبەر دەرچوونەکەی خەڵکی مەدینەدا خۆی گۆشەگیر کردو، بەشداری لەگەڵ نەکردن، تەنها جومعەکان‌و جەژنەکان نەبووایە بۆ هیچ شتێکی تر لەگەڵیان تێکەڵاو نەدەبوو، بە درێژایی ڕۆژ لەنێو مزگەوتدا دەمایەوەو بە شەو نەبووایە نەدەهاتە دەرەوە، ئەو ئەمە حاڵی بوو، خەڵکیش لە ڕۆژانی (حوڕڕە)دا سەرگەرمی جەنگ‌و کوشتار بوون.[3]

لەوەی ڕابورد دەرکەوت کە خەڵکی مەدینە لە بەرانبەر بەیعەتدات بە یەزیدو چوونە ژێر فەرمانی ئەوەوە بوون بە دوو بەش، بەشی یەکەمیان ژمارەیەك لە خەڵکانی دەروون گەرم‌و حەماسی‌و بە پەرۆش بۆ دین سەرکردایەتیان دەکردو دەیانویست بە هەموو توانایەکیانەوە یەزید لە پۆستی خیلافەت دابەزێنن، ئەمەو چەند زانایەك کە دیارترینیان محمدی کوڕی

---

١ الطبقات (٥/١٤٥).

٢ أثر العلماء في الحياة السياسية (ص: ٥١٤).

٣ الطبقات (٥/١٣٢)، سير أعلام النبلاء (٤/٢٢٨، ٢٢٩).

عمـڕوی کـوڕی حـزم بـوو لـە پێنـاو لێخـستنی (یەزیـدی کـوڕی معاویـە) پەیوەنـدیان بـە شۆڕشگێڕانی مەدینەوە کردو لە جەنگی (حوڕڕە)دا ڕووبـەڕووی سـوپای ئومـەوی بوونـەوە.[١]
بەمە بزوتنەوەکەی مەدینـە لـە میانـەی بەرهەڵسـتی کردنـی حوکومەتەکـەی یەزیـدی کـوڕی معاویەدا لەسەر سێپای مەرجەعی شەرعی ئەو زانایانە خۆی ڕاگرت کـە پـشتیوانیان لێ کـردو هاتنە نێو ڕیزەکانیانـەوە. ئەمـەو شۆڕشـەکە بـەو تایبەتمەندیەیـەوە پـشتی بـە فتـوای ئـەو زانایانە بەست، کە لە پێش هەموویانەوە فتوای حوسێنی کـوڕی عـەلی بـوو لەسـەر پێویـست (واجب) بوونی بەرەنگاربوونـەوەی خراپـە. ئەمـە لـە لێدوانـەکانی عبـداللەی کـوڕی حنظلـةدا دەردەکەوێ، کە وتی: ئەی گەلەکەم پارێز لەو خودایە بکەن کە یەکەو بـێ شـەریکە، سـوێند بە خودا لە ترسی بەردبارانی ئاسمان نەبووایە قەد لە دژی یەزید دەرنەدەچووین.[٢]
چەند هاوەڵێکی بچکۆلەش بەشداری شۆڕشەکەیان کرد، لەوانە: عبـداللەی کـوڕی یەزیـدو، عبدالرحمنی کوڕی أزهرو، عبداللەی کوڕی حەنزەڵە.[٣] بەڵام زۆرینەی هاوەڵە گەورەکان کە تا ئـەو کاتـە لـە ژیانـدا مـابوون بەشـدارییان تێـدا نـەکرد، بـەڵکو هـەوڵیان دەدا قەناعـەت بـە شۆڕشـگێڕەکان بکـەن واز لـەم کارەیـان بێـننو لـە دژی حوکومەتەکـەی یەزیـد دەرنەچـنو بەیعەتەکەی ڕەت نەکەنـەوە.[٤] لەگـەڵ ئـەوە ئـەو بنـەما شـەرعیانەی بزوتنەوەکـەی خـەڵکی مەدینە لە بەرانبەر حوکومەتەکەی یەزیددا پشتی پێ بەسـتبوون، هـەمان بنـەمای شـەرعیو فتوابوون کە حوسێن لە شۆڕشەکەی خۆیدا پشتی پێوە دابوون، کە بریتی بوون لە:( فەرمان کردن بە چاکەو ڕێگەگرتن لە خراپە لەسەر زانایانو سـەرکردەکانی ئۆممـەت واجبـە، (بـەنی ئومەییە) لە حوکمڕانیانـدا سـنوورەکانی شـەرعیان بەزانـدوون، چ جـای لـە بـواری سیاسـیو شێوازی حوکمڕانیدا بـێ، وەك دەسـەڵاتی تاکڕەوانـەو خۆسـەپاندنو دیارنـەبوونی شـوڕا، چ جای لە بواری کەسـایەتیدا بـێ وەك: نـەبوونی لێوەشـاوەییو شایـستەییو دادپـەروەری لـە کەسـایەتی یەزیـددا)، بـەڵام لێـرەدا جیاوازییـەکی گـەورە لـە بـواری شـەرعیبوونی ئـەم دوو بزوتنەوەدا هەیە، حوسێن (ڕەزای خوای لێ بێت) هەتا فتواکەی بە چاکی دانەمەزراند بڕیاری نەدا لە دژی یەزید ڕاپەڕێ، حوسێن هەر لە سەرەتای کاریدا بەیعەتی بـە یەزیـد نـەدا، ئیـدی بەم پێوانەیە پێی وابوو کـە ئـەو لـەم ڕووەوە هـەقی بـە دەسـتەوەیە ئازادانـە هەڵسوکەوت

---

١ الطبقات الكبرى (٥/٦٩، ٧٠).

٢ الطبقات الكبرى (٦/٦٦).

٣ قيم المجتمع (٢/٤٧) للعمري، الفقهاء والخلفاء (ص: ٣١).

٤ الفقهاء والخلفاء (ص: ٣١) سلطان حثلين.

بنوێنیێو لە دژی حوکومەتی ئومەوی شۆڕش بەرپا بکات، بەڵام لەم نێوەدا دەبینین کە دانیشتوانی مەدینە لە سەرەتای کاردا بەیعەتیان بە یەزید داوەو، دوای ئەمە کە تەماشایان کردووە –بە حیسابی ئەوان– یەزید شایستە نیەو بۆ پۆستی حوکمڕانی گونجاو نیە، پێیان وابوو بۆیان دروستە بەیعەتەکە هەڵوەشێننەوەو یەزید لێ بخەن، ئیتر بەم هەڵوێستەیان ڕەهەندێکی تازەیان خستە سەر فتواکەی حوسێن کە بریتیە لەوە: هەر دەمایەك سەرۆکی موسڵمانان دەرکەوت کە (لار ولاریێ وگەندەڵە) دروستە لێ بخرێت. دیارە تەواوی یارانی پێغەمبەر (ﷺ) واتە بەشی دووەمی خەڵکی شاری مەدینە لەگەڵ ئەم خاڵەیاندا نەیار بوون،لەوانەیە هەر ئەمەش هۆی هەرەسەرەکی بوویێ وا لە کەڵەزانایانی مەدینە لە هاوەڵان کردبێ بە توندی ڕەخنە لەم دەرچوونەی خەڵکی مەدینە بگرنو، ڕای بگەیەنن کە: هەڵوەشاندنەوەی بەیعەت دروست نیەو لاڕێبوون (فیسق)ی سەرۆك دەرچوونو شۆڕشکردن لە دژی واجب ناکات.[1] جگە لەمەش ئەم گەورە هاوەڵو کەڵەزاناو فتوا بەدەستانە ئەوانەی لەو کاتەدا ئامادە بوون، مەترسی خۆیان لەسەر شاری مەدینەو کوشتو کوشتاری دانیشتوانەکەیو شکاندنی پیرۆزییەکانی مەدینەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ڕاگەیاند، دیارە ئەمەش بە کردەوە ڕوویدا.[2] لەگەڵ ئەمەدا کە هیچ کامێك لە هاوەڵانو شەرعزانان بەم هەڵوێستەی یەزید لە کوشتو کوشتاری خەڵکی گۆڕەپانی (حەڕڕە)و حەڵاڵکردنی مەدینە ڕازی نەبوون.[3] بەڵکو إبن تیمیة پێی وایە: ئەم هەڵوێستو ڕەفتارەی یەزید نواندی لە ڕیزی تاوانە هەرە گەورەکاندا حیساب دەکرێ.[4]

## سێیەم: جەنگی (الحرة):

کاتێك هەواڵ بۆ یەزید هات کە ئەندامانی (بەنی ئومەییە) لەماڵی مەروانی کوڕی حەکەمدا گەمارۆ دراون دنیای لێ وێکهات، بۆیە ویستی بەر لەوە بکوژرێن یان هیچ شتێکیان بەسەربێ ئاڵقەی گەمارۆکەیان لەسەر بپسێنێو ڕزگاریان بکات، ئیدی پێی خەفەت بوو ئەو خزمانەی –کە ژمارەیان هەزار کەس دەبوو– بەبێ دەسەڵاتیو قۆڵ بەستراوی بمێننەوەو، ئەویش لەم ئۆجی دەسەڵاتەیدا هیچ یارمەتیەکیان نەدا، بۆیە بە پەلەپەل سوپایەکی بۆ

١ الفقهاء والخلفاء (ص: ٣٢).

٢ تأريخ خليفة (ص: ٢٣٨، ٢٣٩)، الفقهاء والخلفاء (ص: ٣٢).

٣ حركة النفس الزكية (ص: ٣٠)، الفقهاء والخلفاء (ص: ٣٠).

٤ الفتاوى، نقلا عن الفقهاء والخلفاء (ص: ٣٢).

ڕزگارکردنی بەنی ئومەییەو سەرکوتکردن‌و گێڕانەوەی ئەو هەڵگەڕاوانە بۆ ژێر باری فەرمانبەرداری ساز کردو بەرەو مەدینەی ڕەوان کرد، داوای لە عەمروی کوڕی سەعید کرد ببێتە فەرماندەی سوپاکە، بەڵام قبوڵی نەکرد، ئەمەو بۆ لای عبیداللەی کوڕی زیادی ناردو ڕایسپارد کە دانیشتوانی مەدینە بەرەو ژێر چەتری طاعەت بگێڕێتەوەو، ئەمجا بڕواتە مەککەو جەنگ لەگەڵ عبداللەی کوڕی زوبێر بکات، لە وەڵامدا وتی: هەرگیز ئەم دوو شتانە لەسەر خۆم بۆ فاسق بوون کۆناکەمەوە، کوڕی کچی پێغەمبەری خودا (ﷺ) بکوژم‌و ماڵی خوداش داگیر بکەم؟![1] ئەمجا ڕاو تەگبیر لەسەر ناردنی موسلیمی کوڕی عوقبەی موڕڕی جێگیر بوو.[2]

١ـ وەصیێتی یەزید بۆ موسلیم:

سوپا کۆبۆوەو موسلیمی کوڕی عوقبە نێتی هێنا بەرەو مەدینە پێشی بکەوێ، یەزید پێی وت: سێ ڕۆژ لەسەر یەك بانگهێشتی خەڵکەکە بکە، ئەگەر گەڕانەوە ژێر فەرمان، بڕۆو وازیان لێ بێنە، ئەگەرنا کۆمەك لە خودا بخوازەو جەنگیان لەگەڵ بکە، ئەگەر بەسەریاندا سەرکەوتی، مەدینە بۆ ماوەی سێ ڕۆژ حەڵاڵ بکە، ئەمجا کۆڵیان لێدە، تەماشای عەلی کوڕی حوسێن بکەو نەیەڵی کەس بە خراپە دەستی بۆ درێژ بکات، ئامۆژگاری چاکی لێ بخوازە، خۆت لە مەجلیسی ئەو نزیك بکەوە، چونکە ئەو نەچۆتە نێو ئەو شتەی کە خەڵك چوونە نێویەوە -واتە بازنەی بەرهەڵستکاری-، ئەمجا فەرمانی بە موسلیم کرد، دوای لێبوونەوەی لە سەرکوتکردنی شۆڕشەکەی خەڵکی مەدینەو داگیرکردنی مەدینە، سوپاکەی کۆ بکاتەوەو بە خاتری گەمارۆدانی عبداللەی کوڕی زوبێر بەرەو مەککە بەڕێ بکەوێ، پێی وت: ئەگەر تۆ شتێکت بەسەر هات، ئەوا حەصینی کوڕی نەمیری سکونی دەبێتە ئەمیری سوپاکە.[3]

٢ـ موسلیم سوپاکە دەخاتەڕوو:

موسلیمی کوڕی عوقبە سواری ئەسپەکەی بوو، سوپا ئامادەباشەکەی کە بۆ جەنگی مەدینەی ڕێکخستبوو خستەڕوو، عبداللەی کوڕی مەسعەدەی فەزاری کردە فەرماندەی سەربازە دیمەشقیەکان، (حەصینی کوڕی نەمیری سکونی) بەسەر سەربازانی (حمص)ەوە

---

١ تأريخ الطبري (٦/٤١٧).

٢ تأريخ الطبري (٦/٤١٦).

٣ البداية والنهاية (١١/٦١٧).

داناو، (حسێنی کوڕی دلجەی قینی) بەسەر سەربازانی (ئەردەن) ەوە دانا، (ڕوحی کوڕی زنباعی جوزامی‌و شەریکی کەنانی)بە جووتە کردنە فەرماندەی سەربازە فەلەستینیەکان‌و، (طەریفی کوڕی حەسحاس)یشی بەسەر سەربازانی (قسرین)ەوە دانا، بۆ خۆشی -واتە (موسلیمی کوڕی عوقبەی موڕڕی غەطفانی)- بوو بە فەرماندەی گشتی سوپاکە.[1] موسلیم بەرەو مەدینە کەوتەڕێ، بینی تایەفەی بەنی ئومەییە دەرکراون‌و بەرەو شام دێن، ڕایگرتن‌و سەبارەت بە بارودۆخی مەدینە پرسیاری لێکردن، بەڵام وەڵامیان نەدایەوە، چونکە کاتێك خەڵکی مەدینە گەمارۆیان لەسەر لابردبوون سوێندیان دابوون‌و پەیمانیان لێ ستاندبوون، کە نهێنی‌و خاڵە لاوازەکانی خەڵکی مەدینە بۆ کەس نەدرکێنن‌و، هاوکاری دوژمنیان نەکەن، موسلیم تکای لێ کردن کە پێی بڵێن لە پشت ئەوانەوە چ باسە، بەڵام وەڵامیان نەدایەوە، لێرەدا موسلیم بە توندی توڕەبوو، هەرچۆنێك بێ عبدالملك ی کوڕی مەڕوان توانی توڕەییەکەی بنیشێنێتەوەو، پێی وت کە پێویستە چ نەخشەیەك بۆ داگیرکردنی ڕەچاو بکات، ئاماژەی بۆ کرد کە چاك وایە لە باری ڕۆژهەڵاتەوە بۆی بچێت‌و لە باری خوارووشەوە لە ناوچەیەك کە (حوڕڕە)ی پێ دەوترێت ڕووبەڕووی خەڵکی مەدینە ببێتەوە، بەم شێوەیە خۆر لە باری لای سوپای شامەوە هەڵدێت‌و تیشکەکەی بەر تاسکڵاوە سەربازیەکانیان‌و شمشێرەکانیان دەکەوێ‌و، بریسکەکەیان ترس دەخاتە دڵی دوژمنیانەوەو، هەروەها لە بواری جەنگیشەوە ئەوان زیاتر دەستیان بەسەر ئەم ناوچەیەدا دەشکێ.[2]

٣ـ دەستپێکرانی جەنگ:

ڕۆژی چوارشەممە تەنها دوو شەوی بۆ مانگی (ذو الحجة) قوربانی ٦٣ك مابوون، جەنگە شومەکە دەستی پێکرد، موسلیم بە ئەسپسوارەکانیەوە پەلاماری خەڵکی مەدینەی داو هەردوولا پێك هەڵشاخان، عبداللهی کوڕی حەنزەڵەی غەسیل هەڵمەتێکی کردە سەر هێزەکەی شام‌و، شکاندنی هەتا گەیاندنیەوە لای موسلیم، موسلیم ڕاپەڕی‌و بە خۆی‌و جەماعەتی تایبەتی خۆی پەلاماری بردو، جەنگێکی توندو دەستەویەخە ئەنجام درا، خەڵکی مەدینە لە هەموو لایەکەوە شکان، فەزڵی کوڕی عەباسی کوڕی ڕەبیعە بە هانای عبداللهی کوڕی حەنزەڵەوە هات‌و داوای لێکرد چەکدارەکان کۆبکاتەوەو یارمەتی بدات‌و لەگەڵی بجەنگێ‌و، بڕیاریدا هەرچۆنێك بێ دەبێ خۆی بگەیەنێتە موسلیمی کوڕی عوقبەو بیکوژێت،

---

١ البداية والنهاية (١١/٦١٧).

٢ الدولة الأموية، د. العش (ص: ١٧٦)، الخلافة الأموية للهاشمي (ص: ٨٥).

عبداللەی کوڕی حەنزەڵەی کوڕی غەسیل فەرمانی دا سوارەکان لە دەوری فەزڵ کۆببنەوەو لە دوای ئەوەوە جەنگ بکەن، فەزڵ بە خۆیو سوارەکانیەوە هەڵمەتی بردە سەر خەڵکی شامو کەلێنی تێخستن، بەسەر تەرمی کوژراوەکاندا ڕۆیشتو بەرەو ئاڵابەدەستەکە ڕۆیشتو کوشتی، کە بە حیسابی خۆی وایزانی ئەمە موسلیمە،[1] ئەو کەسەی کوژرا خزمەتکارێکی موسلیم بوو بە ناوی (ڕۆمی)، موسلیم بەیداخەکەی هەڵگرتو بەنێو سوپاکەیدا هاواری دەکردو، هانی دەدان جەنگ بکەن، یەکێك لە فەرماندەکانی ڕاسپارد عبداللەی کوڕی حەنزەڵەی کوڕی غەسیل بە تیر بکوژێت، ئەمجا هاواری کردو وتی: هۆ خەڵکی شام، ئەمەیە شەڕی کەسانێك کە دەیانەوێ بەرگری لە دینەکەیان بکەنو، سەرکەوتنو دەسەلات بۆ ئیمامەکەیانی پێ مسۆگەر بکەن؟! ، دەك داوەشێن بۆ چ کوشتارێکی دەیکەن، ئای دڵم چەند بەمە تەنگەو چەندەی ڕق هەستاندوم! بەڵام وەڵاهی دەبێ سزاتان بدەمو لە بەرانبەر ئەمەدا موچەتان لێ ببڕمو بتاننێرمە پێشەوەی سەنگەرە سەرسنووریەکانو لەوێ بەندتان بکەم، دەی لە دەوری ئەم بەیداخە کۆببنەوەو خۆتان گورجو گۆڵ بکەن، ئاڵایەکەی بەرز کردەوەو هەڵمەتی برد، تاقمەکەی گەڵی خۆیان گشت کردو بەدوای کەوتن، تەنها بە دووری چەند باڵێك لە تەنافەکەی دەورەی موسلیم، فەزڵی کوڕی عەباسی کوڕی ڕەبیعەو زەیدی کوڕی عبدالرحمن ی کوڕی عەوفو ئیبراهیمی کوڕی نەعیمی عەدەویو ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی مەدینە کوژران.[2]

ئەمجا هێزەکەی موسلیم بە سوارەو پیادەیەوە بەرەو لای عبداللەی کوڕی حەنزەڵەی کوڕی غەسیلو پیاوەکانی هێرشیان برد، موسلیم سواری ئەسپێکی ببوو، لەنێو قەدی خەڵکی شام دەڕۆیشتو دەیوت: ئەی خەڵکی شام، ئایا ئێوە بە حەسەبو نەسەب لە هەموو عەرەبێك ڕەسەنتر نینو ژمارەتان زیاتر نیەو، وڵاتتان لە هی هەمووان فراوانتر نیە؟ ئەی خودا تایبەتمەندی نەکردوون بە سەرکەوتنی بەسەر دوژمنتاندا؟و بەرزترین پایەی پێ نەبەخشیون بە لای ئیمامەکانتانەوە؟ بزانن کە ئێوە بە هۆی گوێڕایەڵیو فەرمانبەرداریتانەوە ئەم گەورەییو مەزنایەتیەتان پێ بەخشراوە، ئەم هۆزەو هاوشێوەکانیان لە هۆزە عەرەبەکان خۆیان لێ گۆڕاو خواش گۆڕانی بەسەردا هێنان، باشترینو جوانترین فەرمانبەرداریو گوێڕایەڵی تۆمار بکەن، خوداش جوانترینو باشترین

---

١ تأريخ الطبري (٦/٤٢٣).
٢ تأريخ الطبري (٦/٤٢٣).

سەرکەوتنتان بۆ تۆمار دەکات.[١] موسلیم تیراندازترین کەسی خۆی دیاری کرد تا تیر لە ئیبنولغەسیل بگرێ، (ئیبنولغەسیل)یش وتی: بە چ هەقێك خۆیان بۆ دەکەن بە نیشانە؟ کێ دەیەوێ پەلە بکات بۆبەهەشت، با بەم بەیداخەوە پابەند بێ، هەموو ئەوانەی مەرگیان هەڵبژارد لە دەورەی کۆبوونەوە، جا وتی: یاڵلا بەرەو پەروەردگارتان بڕۆن، سوێند بە خودا ئومێدەوارم چاوو دڵتان لە خۆشیان ئارام بگرن، جا خەڵکەکە راپەڕیو شەڕێکی وا توندو دەستەویەخەیان کرد کە لەو سەردەمەدا وێنەی نەبینرابوو، ئیبنولغەسیل ڕۆڵەکانی خۆی خستە پێش خۆیەوەو هەتا هەموویان یەك بە یەك لەبەر چاوی خۆی کوژران، دواجار خۆیشیو براکەشی کوژران.[٢]

٤ـ کۆتایی هاتنی جەنگ: جەنگەکە بە بەرژەوەندی سوپای شام کۆتایی هاتو، خەڵکی مەدینە بە خراپی تێك شکانو ژمارەیەکی زۆر لە سەرکردەو کەسە دیارەکانیان کوژران، مەڕوانی کوڕی حەکەم داخو خەفەتو پەرۆشی خۆی بۆ عبداللەی کوڕی حەنزەڵەو محمدی کوڕی عەمری کوڕی حەزمو ئیبراهیمی کوڕی نەعیمی کوڕی نەحامو هاوشێوەی ئەم کەڵەپیاوانە نەدەشاردەوەو، بەڵکو ستایشی دەکردنو بە جوانترین سیفەت کە پێیانەوە بەناوبانگ بوون باسی دەکردن.[٣] کوشتارێکی زۆر لە مەدینەییەکان کرا، ریوایەتەکە بە حوشتر ملی ئاوارەو پەڕاگەندەیان وێنا دەکات، بە چەشنێك شامیەکان لە هەموو لایەکەوە پەلاماریان دەدانو دەیانکوشتن.[٤] لەم جەنگەدا ژمارەیەك هاوەڵ (ڕەزای خوایان لێ بێت) کوژران، بەڵگە بۆ ئەمە، ئەم وتەیەی (سەعیدی کوڕی موسەییەب)ە: ئاشوبی یەکەم -واتە کوژرانی عثمان- ڕووی داو هاوەڵانی بەشداربووی بەدر کەسیان لێ نەمایەوە، ئەمجا ئاشوبی دووەم -واتە کارەساتی حوڕڕە- ڕووی دا، هاوەڵانی حودەیبیە کەسیان لێ نەمایەوە، ئەمجا سێیەم ڕووی دا کەسێك لە هاوەڵان لەنێو خەڵکدا نەمایەوە، خەلیفە لە مێژووەکەی خۆیدا لیستە ناوێکی لەسەر کوژراوانی (حوڕڕە) داناوەو، ئەمجا دەڵێ: تەواوی ئەوانەی لە قورەیشو ئەنصارِ بەر ئەم کوشتارە کەوتن ژمارەیان سێ سەدو شەش پیاو بوو.[٥] أبو

---

١ تأريخ الطبري (٤٢٣/٦).

٢ تأريخ الطبري (٤٢٤/٦).

٣ الطبقات (٥/٦٨، ٧١)، المحن (١٧٩).

٤ الطبقات (٥/٦٨).

٥ تأريخ خليفة (ص: ٢٥٠)، مواقف المعارضة (ص: ٤٢٢).

العرب[١] و ئەتابەکی[٢]یش هەمان قسەیان کردووە، لێرەدا ڕیوایەتێك هەیەو خراوەتە پاڵ ئیمام مالیك کە وتوویەتی: کوژراوانی (حوڕڕە) بریتی بوون لە حەوت سەد کەسی قورئان لەبەر، ڕاوی دەڵێ: پێم وابێ ئەو (واتە مالیك) وتی: سێ یان چوار هاوەڵی پێغەمبەری خودا (ﷺ)یان لەگەڵدا بوون.[٣] ڕیوایەتەکەی مالیك لە ڕووی ڕاستو دروستیەوە لە ڕیوایەتەکەی خەلیفە بەهێزترە.[٤]

٥ـ ئەو زیادەڕەویانەی هەندێك کەس سەبارەت بە ژمارەی کوژراوانی خەڵکی مەدینە کردوویانە:

هەتا بڵێی نامۆو جێی سەرنجن، بۆ وێنە ڕیوایەتەکەی واقیدی کە زۆربەی مێژوونووسە کۆنو تازەکان بە گەرمی هێناویانە، واقیدی دەڵێ: عبداللەی کوڕی جەعفەر وتی: پرسیارم لە (الزهـري) کرد: ژمارەی کوژراوانی (الحرة) گەیشتە چەند؟ وتی: حەوت سەد کەس لە قورەیشو پشتیوانانو کۆچەرانی عەرەبو کەسایەتیە دیارەکان کوژرانو، دە هەزار کەسیش لە تێکڕای خەڵکەکەی تر کوژرانو لەو نێوەدا ژمارەیەك ژنو منداڵیش بەر هێرشی ئەم کوشتارە کەوتن.[٥]

ئەوە لێگەڕێ کە سەنەدی واقیدی (مەتروك)ە، لە لایەکی ترەوە سەنەدێکی زۆر بەهێزو ڕاستو دروست (صحیح) کە ڕیوایەتەکەی مالیکە لە بەرانبەری دەوەستێ، کەواتە ڕیوایەتەکەی واقیدی حیسابی (مونکەر)ی بۆ دەکرێتو لە دیاریکردنی ژمارەی کوژراوەکاندا پشتی پێ نابەسترێت،[٦] إبن تیمیة ئینکاری ڕاستو دروستی ڕیوایەتەکەی واقیدی دەکاتو بە دووری دەزانێ ژمارەکە خۆی لەم ئاستە دابێ.[٧]

٦ـ تالانکردنی مەدینە: وا مەشهورە کە موسلیمی کوڕی عوقبەی موڕڕی فەرمانی بە تالانوبڕۆکردنی مەدینە کردبێو، ماوەی سێ ڕۆژی کۆتایی مانگی قوربان هەتا بینینی مانگی نوێی موحەڕڕەم لەسەر ئەم تالانکردنە بەردەوام بوون، ئەمجا فەرمانی بە سوپاکەی کرد واز

١ المحن (ص: ١٨٧، ٢٠٠).
٢ النجوم الزاهرة (١/١٦٠).
٣ المحن (ص: ٢٠٠)، بإسناد صحيح، مواقف المعارضة (ص: ٤٢٣).
٤ مواقف المعارضة (ص: ٤٢٣).
٥ المحن (ص: ١٨٤)، وفاء الوفاء (١/١٣٢)، مروج الذهب (٣/٧٩)، مواقف المعارضة (ص: ٤٢٤).
٦ مواقف المعارضة (ص: ٤٢٤).
٧ مناهج السنة (٤/٧٧٥).

بێنن، ئەمە بە حوکمی ئەوە کە جەنگ دەستی پێکرد سێ ڕۆژ لە مانگی قوربانی ساڵی ٦٣ی کۆچی مابوون، لەم بوارەدا ڕیوایەتەکەی نافیعی خزمەتکاری عبداللەی کوڕی عمر بە ڕاست‌و دروستترین ڕیوایەت دادەنرێ، نافیع وتی: .. (موسلیمی کوڕی عوقبە) بەسەر خەڵکی مەدینەدا سەرکەوت‌و سوپاکەی خەڵکێکی زۆریان کوشت‌و بۆ ماوەی سێ ڕۆژ مەدینە تاڵان‌و بڕۆ کرا.[١] هەڵبەتە وشەی (إستباحە) کە لەسەر زمانی پێشینانی (سلف) هاتووە، واتای تاڵانکردن دەگەیەنێ، وەکو کە عبداللەی کوڕی یەزیدی الشخیر دەڵێ: ولما استبیحت المدینة –یعني الحرة– دخل أبو سعید الخدري غاراً.[٢] واتە: کە مەدینە (إستباحة) واتە تاڵان‌و بڕۆ کرا –لە کاتی کارەساتەکەی حەڕڕەدا– ئەبو سەعیدی خودری چووە نێو ئەشکەوتێکەوە. لێرەدا دەزانرێ کە هەردووك وشەی (إستباحة والنهب) کە لە زۆربەی سەرچاوە دێرینەکاندا هاتوون، بۆیەك واتا هاتوون کە بریتیە لە تاڵان‌و بڕۆ.[٣] بڕیاری تاڵانکردنی مەدینەش لە لایەن خودی یەزیدی کوڕی معاویەوە دەرکرابوو، ئیمام ئەحمەد تۆباڵی ئەم تاڵانیە دەخاتە ئەستۆی ئەو، کاتێك (مەهنای کوڕی یەحیای شامی سەلەمی) سەبارەت بە یەزید پرسیاری لە ئیمام ئەحمەد کرد، ئیمام وتی: ئەوەی دەرهەق بە مەدینە کرا ئەو کردی، وتم: چی کرد؟ وتی: تاڵانی کرد.[٤] إبن تیمیة دەڵێ: سوپایەکی بەسەر (دانیشتوانی مەدینە) وەرکردو، فەرمانی پێکرد، ئەگەر لەماوەی سێ ڕۆژدا نەیەنەوە ژێرباری گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەرداری، دەبێ بەهێزو زەبری شمشێر بچێتە نێویەوەو بۆ ماوەی سێ ڕۆژ تاڵان‌و بڕۆی بکات،[٥] (إبن حجر)یش لەسەر هەمان ڕاوبۆچوونە.[٦] هیچ گومان لەوەدا نیە کە نەبوونی ئاسایش‌و بڵاوبوونەوەی ترس‌و تۆقاندن لە مەدینەدا، وای لە هەندێك خەڵك کرد مەدینە چۆڵ بکەن‌و پەنا بۆ چیاکانی دەوروبەر بەرن، وەك دەبینین أبو سعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێت) شمشێرەکەی بە ملیدا دەکات‌و مەدینە بەجێ دەهێڵێت‌و، دەچێتە نێو ئەشکەوتێکەوە، کابرایەکی شامی دەچێتە سەر ئەشکەوتەکەو فەرمانی پێ دەکات بێتە دەرەوە، پێی دەڵێ: نایەمە دەرەوە، ئەگەر بێیتە ژوورەوە دەتکوژم، کابرا خۆیەنێو ئەشکەوتدا دەکات‌و، أبو

---

١ الطبقات الکبری (٣٨/٥)، بإسناد حسن.

٢ الطبقات، نقلا عن مواقف المعارضة (ص: ٤٢٧).

٣ الطبقات (٢٢٥/٥)، مجمع الزوائد (٢٤٩/٧).

٤ السنة للخلال (ص: ٥٢٠)، طبقات الحنابلة (٢٤٥/١).

٥ الوصیة الکبری (ص: ٤٥٢).

٦ تهذیب التهذیب (٣١٦/١١).

سعید شمشێر لەسەر گەردنی دادەنێو، دەڵێ: بە گوناهی خۆمو خۆتەوە بگەڕێوە –و بمرە– ، کابرا دەڵێ: تۆ أبو سعیدی خودری؟ دەڵێ: بەڵێ، دەڵێ: کەواتە داوا لە خودا بکە لێم خۆش بێ، جا –ئازادی کردو– دەرچوو.[١] واقیدی دەڵێ: خەڵکی شام لە تۆڵەی ئەمەدا گرتوویانەو ریشیان بە ئاگر سووتاندووە، بەڵام ئەمە لە رێگای ڕاستو رێکو صەحیحەوە نەهاتووە.[٢] ئەوەی جێی تێبینی بێو پێویست بێ بیزانین ئەوەیە کە: تاڵانو بڕۆ هەموو شاری مەدینەی نەگرتبۆوە، نەمانبیستووە ماڵی عبدالله‌ی کوڕی عومەرو عەلی کوڕی حوسێنو هاوچەشنی ئەمان کە نەچووبوونە ریزی شۆرشگێڕانەوە تاڵان کرابن، بەڵکو تاڵانو بڕۆ تەنها ئەو شوێنانەی گرتەوە کە جەنگیان تێدا دەکراو ماڵی ئەو کەسانەی گرتەوە کە خۆیان بۆ دژایەتی کردنی حوکومەتی ئومەوی یەکلا کردبۆوە.[٣] لە ڕاستیدا کاتێك یەزید بە موسلیمی کوڕی عوقبەی وت ماوەی سێ ڕۆژ مەدینە تاڵان بکات، هەڵەیەکی گەورەو تاوانێکی نەشیاوی کرد، چونکە لەو سێ ڕۆژانەدا تاوانگەلی گەورەو زەبەلاح لە مەدینەی نەبەویدا ئەنجام دران کە لە وەصف کردن نایەنو، جگە لە خودای گەورە کەس بە ڕادەی خراپیەکەیان نازانێ، یەزید ویستی بە ناردنی موسلیمی کوڕی عوقبە پایەکانی حوکومەتەکەی چاکتر ڕاگیر بکاتو ماوەی دەسەڵاتەکەی درێژ بکاتەوە، بەڵام خودا بە پێچەوانەی نێتو نیازی خۆی سزای داو چۆن پشتی زۆردارو ستەمکارو ملهوڕانی شکاندبوو ئاواش پشتی ئەوی شکاندو، هەردووك صیفەتی عیززەتو قودرەتی خۆی لێ خستنەکارو گرتیو لە زەوی دا.[٤] پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێت: ((لا يكيد أهل المدينة أحد إلا إنماع كما ينماع الملح في الماء))[٥] واتە: هەر کەسێك فێڵو تەڵەکە لە دژی دانیشتوانی مەدینە ئەنجام بدا دەتوێتەوە، چۆن خوێ لەنێو ئاودا دەتوێتەوە. یەکێکی تر لەو فەرموودانەی بەڵگەیە لەسەر قێزەونی تاوانی ترساندنی دانیشتوانی مەدینەو پاشەڕۆژی خراپی بکەرەکەی ڕوون دەکاتەوە.[٦] ئەم فەرموودەی پێغەمبەرە (ﷺ): ((من أخاف أهل المدينة أخافه الله عز

---

١ تأريخ خليفة (ص: ٢٣٩)، إسناده صحيح.

٢ مجمع الزوائد (٧/٢٥٠)، مواقف المعارضة (ص: ٤٣١).

٣ مواقف المعارضة (ص: ٤٣١).

٤ البداية والنهاية (١١/٦٢٧).

٥ البخاري رقم (١٨٧٧).

٦ من تصلي عليهم الملائكة، ومن تلعنهم (ص: ٦٨).

وجل، وعليه لعنة الله والملائكة والناس أجمعين، لايقبل الله منه يوم القيامة صرفاً ولا عدلاً))[١]
واتە: هەر کەسێك خەڵکی مەدینە بترسێنێ، خودای گەورە دەیترسێنێتەوەو، نەفرینی خوداو فریشتەکانو هەموو خەڵکی بەسەردا دەڕژێو ڕۆژی قیامەتیش خودا نە فەرزی لێ وەردەگرێ، نە سوننەت.

٧ـ قسەگەلێك کە سەبارەت بە ناموس بردن کراون: ئەم قسانە نە لە کتێبەکانی حەدیثو سوننەتدا دەبینرێن، نە لەو کتێبانەشدا کە دەربارەی ئاشوبەکان (الفتن) نوسراون.[٢] هەروەها لە هیچ کامێك لە کتێبە مێژووییەکانی (الطبري والبلاذري)یشدا کە دەربارەی ئەو سەردەمە دوو سەرچاوەی گرنگی مێژوویینو لە ڕیوایەتەکانیشیاندا زیاتر پشتیان بە چیرۆکهەڵبەستە مەشهورەکانی وەك (عوانەی کوڕی حەکەم و أبي مخنفی شیعەمەزەب)و چەشنی ئەمانە بەستووە، هیچ ئاماژەیەك بە ڕوودانی شتێکی لەم جۆرە نەکراوە.[٣] یەکەمین کەس کە ئاماژەی بەم بابەتە –واتە شکاندنی شەرەفو ناموس– کردبێ (المدائني) بووە کە لە ساڵی ٢٢٥ کۆچیدا مردووە، (المدائني) دەڵێ: (أبي قرة) لە هوشامی کوڕی حەسانەوەی گێڕاوەتەوە، کە وتوویەتی: دوابەدوای جەنگی حوڕڕە هەزار ئافرەتی بێ مێرد منداڵیان بووە، (إبن الجوزي)یش بە یەکەمین کەس دادەنرێ کە ئەم هەواڵەی لە مێژووەکەیداو[٤] هەروەها لەو نامە تایبەتەیدا هێناوە کە وەك تانەو تەشەرنامەیەك لەسەر یەزیدی کوڕی معاویەی نوسیووەو صیفەتە نەنگو لەنگەکانی خستوونەڕوو.[٥] (سەمهودی)ی مێژوونووسی مەدینە کە لە (٨٤٤ـ٩١١ك، ١٤٤٠ـ١٥٠٧ز)یدا ژیاوە ئەم ڕیوایەتەی لە (إبن الجوزي)یەوە هێناوە.[٦] لەوانەیە طبريو بلاذريو خليفة بن خياطو هی تریش باوەڕیان بە ڕاستو دروستی ئەم هەواڵە نەبووبێت: بۆیە پشتیان تێکردووەو نەیانخزاندۆتە نێو کتێبەکانی خۆیانەوە. بێگومان هیچ هەواڵێکی ڕاستو دروست لە ڕووی سەنەدەوە لەسەر ئەو دەستدرێژیە سێکسیە دەست ناکەوێ کە ئەمانە وتوویانە. لە کتێبی (دلائل النبوة)داو لە ڕێگای یعقوبی کوڕی سفیانەوە هاتووە: یوسفی کوڕی موسا قسەی بۆ کردین وتی: جریری کوڕی موغیرە

---

١ مسند أحمد (٩٤/٢٧)، إسناده صحيح، مؤسسة الرسالة.
٢ (الفتن) لنعيم بن حماد، (الفتن) لأبي عمرو الداني.
٣ مواقف المعارضة (ص: ٤٣٢).
٤ المنتظم (١٥/٦).
٥ رسالة في جواز لعن يزيد، نقلا عن مواقف المعارضة (ص: ٤٣٣).
٦ وفاء الوفاء (١٣٤/١).

قسەی بۆ کردینو وتی: موسلیمی کوڕی عوقبە ماوەی سێ ڕۆژ مەدینەی تالآن کرد، جا موغیرە پێی وابوو لەو ڕۆژانەدا هەزار کچ کراون بە ژن.[١] شیاوی باسە هەر کەسێك هەواڵی دەستدرێژی جینسی سەر دانیشتوانی مەدینەی لە میانەی باسی جەنگی (حەڕڕە)دا کردبێ بە تەنها پشتی بە ڕیوایەتەکەی (یەعقوب) یان ڕیوایەتەکەی (المدائني) بەستووەو بەس.[٢] کە هیچیان فریان بەسەر ڕاستیەوە نیەو قرپۆك و بێ بنەمان. (العصامی)یش بوختانێکی تری باس کردووە کە بەر لەمە وێنەی نەهاتووەو، دەڵێ: بکەری ئەم ڕەفتارە لە بەرانبەر خەڵکانی ماقوڵو بەڕێز ئەمەی ئەنجام دەدا، دەیەویست شتێك پەیدا بکات خوێنەکەی پێ بسڕێت هیچی دەست نەدەکەوت، موصحەفێکی لە نزیکەوە بوو، پەڕەیەکی لێ کردەوەو خوێنەکەی پێ سڕی، پەنا بە خوا دەگرین ئەمە کوفری ڕاشکاوەو بەشە هەرە بۆگەنەکەی کوفرە.[٣] ئەمەو هەندێك نووسەر جڵەوی نەفسو ئارەزوویان بەرداوەو بەبێ ئەوە پشت بە هیچ بەڵگەیەکی ڕاستو ڕۆشنو بەهێز ببەستن هاتوون برەویان بە بڵاوکردنەوەی ئەو ڕیوایەتو چیرۆکانەیانە داوە کە لە دەورەی بوختانەکە (واتەدەستدرێژیە سێکسیەکەی جەنگی (حەڕڕە)ی مەدینە) دەخولێنەوە، کە بە هیچ شێوەیەك ناکرێو ناگونجێ برەوایان پێ بکرێو پشتیان پێ ببەسترێ.[٤] لە لایەکی ترەوە بەڵگەگەلێکی تر لەسەر ڕووداوەکانی جەنگی (حەڕڕە) هەنو بۆنی هیچ جۆرێك لە جۆرەکانی دەستدرێژی جینسیان لێ نایەت، بە چاوی خۆمان هەموو ئەو ڕیوایەتە (حسن)انەمان خوێندەوە کە خرانەڕوو باس لە تالآنکردنی مەدینە دەکەنو، لە هیچ کامێکیشیاندا نەهاتووە باسی لە ئەتککرانی شەرەفو ناموسی خەڵکی ئەو شارە کردبێ.[٥] بێگومان دەستدرێژیکردن بۆ سەر ئافرەتانی مەدینە بێ بنەمایەو، ئەم هەواڵانەش کە ئەمە ڕادەگەیەنن بە درەنگەوەو بە پاڵنەری تاقم تاقمێنەو حزب حربێنەی قێزەونەوە هەڵبەستراونو، هەر بۆ ئەوە مێژووی ئومەوی درزێوو قێزەون بکرێتو سوپای شام کە خۆی لە سوپای ئومەویدا دەنوێنی بە سوپایەکی دڕندەو بێ دینو ئیمانو بێ ڕەوشت بخاتەڕوو، هەڵبەتە مەبەست لەم تاوانبارکردنە تەنها سوپای ئومەوی نیەو بەس، بەڵکو خەتەرەکە لەوەدایە کە تۆمەتەکە سەر دەکێشێ بۆ شتێك کە زۆر لە

---

١ دلائل النبوة (٦/٤٧٥)، مواقف المعارضة (ص: ٤٣٤).

٢ مواقف المعارضة (ص: ٤٣٧).

٣ سمط النجوم العوالي (٣/٩٢)، مواقف المعارضة (ص: ٤٣٨).

٤ مواقف المعارضة (ص: ٤٣٩).

٥ مواقف المعارضة (ص: ٤٣٩).

سوپای ئومەوی گەورترە، سەر بۆ تۆمەتبارکردنی ئەو سوپا ئیسلامیە دەكێشێ كە لەو ماوەیەدا وڵاتانێکی زۆرو فراوانی فەتح کردوون.[1] ژمارەیەك لێکۆڵەری هاوچەرخی وەك: د. نبیه عاقل[2] و العرینان[3] و العقیلی[4] و فلهاوزن[5] بە توندی نکوڵی ئەمەیان کردووە، (الشیبانی)ش لێکۆڵینەوەیەکی قووڵی لەسەر ئەم بابەتە کردووەو پوچەڵی هەموو ئەو درۆو دەلەسەو بوختانانەی سەلماندووە.[6]

٨ــ سەندنی بەیعەت لە خەڵکی مەدینە:

هەڵبەتە چۆنیەتی سەندنی بەیعەت لە خەڵکی مەدینە، یەکێکە لە گەورەترینی هەموو ئەو ڕەفتارانەی یەزید بە هۆیانەوە ڕەخنەی لێ دەگیرێتو پێیانەوە لەکەدار دەکرێت، چەند ڕیوایەتێك باس لەوە دەکەن کە موسلیمی کوڕی عوقبە بەم جۆرە بەیعەتی لە خەڵکی مەدینە سەند: کە ئەوان دەبنە کۆیلەی یەزیدی کوڕی معاویەو، ئەو چۆن حەز بکات ئاوا حوکم بەسەر سەرو ماڵو (خوێنو سامانیان)دا دەدات، لێرەدا ڕیوایەتێکی کورت هەیەو باس لە ئەمە دەکا کە موسلیمی کوڕی عوقبە دوابەدوای کۆتایی هاتنی جەنگی (الحرة) بەیعەتی لە خەڵکی مەدینە سەند لەسەر ئەوە ئەوان کۆیلەی یەزیدی کوڕی معاویەن، ڕیوایەتەکە درێژە پێ دەداتو دەڵێ: ئەم بەیعەتە سەربەستی تەواو بۆ یەزیدی کوڕی معاویە لەخۆ دەگرێو، بەپێی ئەمە دەتوانێ بڕیار لەسەر خوێنو سامانو خانەوادەیان بدات.[7] یەکێك لەو ڕیوایەتانە دەربڕینێکی تر زیاد دەکاتو دەڵێ: ئەوان وەکو کۆیلە لە چوارچێوەی فەرمابەرداریکردن و سەرپێچینەکردنی خودادا بەیعەتیان دا. هەموو ئەم ڕیوایەتانە سەنەدەکانیان زۆر لاوازنو، مەتنەکانیشیان تەمومژاویو لێڵو وێڵنو، لێرەدا هیچ درێژە بەوە نەدراوەو ڕوون نەکراوەتەوە کە ئەوانە کێ بوونو چ کەس بوون بەم چەشنە بەیعەتیان داوە، ئایا هەموو مەدینەییەکان بە عبداللهی کوڕی عمرو عەلی کوڕی حوسێنو أبو سعیدی خودریو سعیدی کوڕی موسەییەبو ئەمانو هەموو ئەوانەش کە بەشداری جەنگی سوپاکەی

---

١ مواقف المعارضة (ص: ٤٣٩ـ٤٤٦).
٢ تأريخ خلافة بني أمية (ص: ١٢).
٣ إباحة المدينة وحديق الكعبة.
٤ خلافة يزيد بن معاوية للعقيلي (ص: ٦٩).
٥ تأريخ الدولة العربية (ص: ١٥٤، ١٥٥)، فلهاوزن.
٦ مواقف المعارضة (ص: ٤٣٢ـ ٤٤٤).
٧ تأريخ خليفة (ص: ٢٣٩)، بإسناد صحيح حتى جويرية بن أسماء، أنساب الأشراف (٤/٣٣٥).

شامیان نەکرد بەم جۆرە بەیعەتیاندا؟، ئەوەی لە هەموو ئەو ڕیوایەتانە وەردەگیرێ ئەوەیە کە: دوای کۆتایی جەنگ موسلیمی کوڕی عوقبە یەکسەر داوای لە خەڵك کرد بێن بەیعەت بدەنو بەیعەتیش لە هەموو کەس وەرگیراوە.[١] هەتا ئەوەی کە عەلی کوڕی حوسێنیان بۆ لای موسلیمی کوڕی عوقبە هێناو ئەویش لەسەر وەصێتەکەی یەزید کە لەسەری پێویست کردبوو هەڵسوکەوتی لە بەرانبەر ئەودا باش بێ ڕێزی تەواوی لێ گرت، ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوە کە دانیشتوانی مەدینە چ ئەوانە لە دژی یەزید ڕاپەڕینیان کردبوو، چ ئەوانەش کە دانیان بە یەزید داهێنابوو، هەر هەموویان بۆ لای موسلیمی کوڕی عوقبە بانگ کراون.[٢] هەندێك ڕیوایەتی تر درێژەیان بە جۆری بەیعەتەکە داوەو، ڕوونیان کردۆتەوە کە ئەم بەیعەتە تایبەت بووە بە تاقمەیەکی دیاریکراوەوە، هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ تووڕەبوونی موسلیمی کوڕی عوقبە لەو تاقمەو هەوڵی داوە بە خستنەڕووی ئەم جۆرە بەیعەتە خۆی لە زیانی ئەوان قوتار بکاتو بیانکوژێ.[٣] د. یوسف العش دەڵێ: موسلیم دوای کۆتایی هاتنی جەنگەکە هەڵسوڕێنەرانی ئاشوبەکەی ئامادە کردنو لە بەرانبەر خەڵکدا ڕاینواندن، داوای لێ کردن بەم شێوەیە بەیعەتی پێ بدەن کە ئەوان کۆیلەی یەزیدنو، بە ویستی خۆی دەتوانێ بڕیار لەسەر خێزانو خوێنو سامانیان بدات، بەڵام ئەوان ئەم جۆرە بەیعەتەیان ڕەت کردەوەو ئەویش کوشتنی، دەیەویست لە ڕێگای سیاسەتی سەرپێ کەچکردنو مل پێ دانەوانو سوكو چروك کردنەوەو لێ سەندنی ئازادی بڕیاردان لەسەر خۆیانو هەرچی هەیانە وەکو کۆیلەیان لێ بکاتو کۆتایی بە ئاشوبەکەیان بێنێتو لە کەسایەتیو پایەبەرزی دایانبەزێنێ.[٤] بێگومان ئەمە لادانێکی گەورەیە لە شەرعی خودای باڵادەستو، بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئەو دەوڵەتە چۆنو چەند بەهۆی تووڕەبوونیو فیشخواردنەوەی زۆری لە بەرانبەر خەڵکی مەدینەدا لە ستەمو خۆسەپاندنو دڵڕەقیو توندو تیژیدا تەواوی سنوورەکانی شەرعو عورفو نەقڵو ئەقڵی بەزاندوون.

٩ـ مردنی موسلیمی کوڕی عوقبە (٦٤ك):

موسلیم وەصێتەکەی یەزیدی بە سەرو پایەوە جێبەجێ کرد، کتوپڕ بەسەر مەدینەی دانەداو یەکسەر شەڕی لەگەڵ نەکردن، بەڵکو پێشدا ئاگاداری کردنەوەو مۆڵەتی پێدان، جا

---

١ تأريخ إبن عساكر، ترجمة معقل بن سنان، نقلا عن مواقف المعارضة (ص: ٤٤٥).

٢ طبقات إبن سعهد (١٢٥/٥)، سير أعلام النبلاء (٣/٣٢٠ـ٣٢١).

٣ مواقف المعارضة (ص: ٤٤٦).

٤ الدولة الأموية (ص: ١٧٦).

کە سێ ڕۆژ تێپەڕی هەوڵی دا قەناعەتیان پێ بکات‌و ئاشتی قبوڵ بکەن‌و سەنگەرەکانی جەنگ‌و پێکدادان چۆڵ بکەن، بەڵام ئەوان بە قسەی ڕەق ڕووبەڕووی داواکانی بوونەوەو ڕەتیان کردەوە کە بچنە ژێر سایەی ئەمانی ئەوەوە، خۆزگە موسلیم لە گەورەیی‌و فەزاحەتی کارەکەی خۆی ورد دەبۆوە کە چەندە خراپەو بۆی ڕوون دەبۆوە کە ئەنجامدانی پاشەڕۆژی خۆی خراپ دەکا! خۆزگە هەر لەسەر گەمارۆدان بەردەوام دەبوو و دەستی نەدەخستە نێو خوێن‌و ماڵی هاوسێکانی پێغەمبەر (ﷺ)! بەڵام ئارەزووی خوێنڕشتن بەسەریدا زاڵ بوو، خۆی بەنێو مەدینەدا کردو، وەیشومەی ترس‌و تۆقاندنێکی گەورەی بەسەر خەڵکەکەیدا هێناو، بە ڕاست‌و چەپدا بەر شمشێری دان‌و کەسە بەرچاوو هەڵبژاردەکانی لێ کوشتن‌و پەرت‌و بڵاوی کردن‌و، جگە لە کەسانێك بە دیل گیران یان بەرەو مەککەو بۆ لای عبدالله ی کوڕی زوبێر هەڵاتن کەسیان بە ساغ‌و سەلامەتی لێ دەرنەچوو، موسلیم زیادەڕۆیی زۆری لە کوشت‌و کوشتارو خوێنڕشتندا کردو، دوای کۆتایی هاتنی جەنگ‌و پاش خۆبەدەستەوەدانی مەدینەش خەڵکانێك هەبوون کە بە ساغی لە جەنگەکەدا ڕزگاریان ببوو ،بەڵام گرتنی‌و کوشتنی، ئەمە لە حاڵێکدا بۆی نەبوو دەستیان بۆ ببا، چونکە جەنگ کۆتایی هاتبوو، مەدینە تەسلیم ببوو ، بەڵام ئەو خوێنی شەڕو شەڕەنگێزی لە دەمارەکانیدا دەگەڕاو سروشتی لەسەر خراپە ڕاهاتبوو، بۆیە نەیتوانی بەسەر خۆیدا زاڵ بێت‌و ئەم تاوانە ئەنجام نەدات، هەر کەسێك بیوتبایە بەیعەت لەسەر کتێبی خوداو سوننەتی پێغەمبەرەکەی یان سوننەتی أبوبکر یان هی عمر دەدەم، ئەوا بەس لەبەر ئەمە دەیکوشت، کە ئەمە قەت نابێتە پاساو بۆ ڕشتنی خوێن‌و کێشانی گیانی خەڵك،[1] بەڵکو ئەمە ستەم‌و زۆرداری‌و خۆسەپاندن‌و ملهوڕیە ئەم حوکمە دەردەکات‌و جێبەجێی دەکات.

لە سەرەتای موحەڕڕەمی ٦٤ك‌و دوای تەواوبونی لە جەنگی مەدینە، موسلیم بە خۆی‌و سوپاکەیەوە بە ئامانجی لێدانی عبداللهی کوڕی زوبێر بەرەو مەککە بەڕێ کەوت، کاتێك گەیشتە گەردەنەی (هَرْش)[2]، فەرماندە سەربازییەکانی بانگ کردن‌و پێی وتن: ئەمیری ئیمانداران ڕایسپاردووم ئەگەر شتێکم بەسەرهات‌و خەریك بوو بمرم، ئەوا دەبێ حەصینی کوڕی نمێری سکونی لەجێی خۆم دانێم، بەخوا ئەگەر فەرمان بە دەست خۆم بوایە ئەوەم نەدەکرد، ئەمجا بانگی کردو وتی: ها کوڕی کورتانەکەر! هەر وەصیەتێکم بۆ کردی لە

---

١ الأمويون بين الشرق والغرب (١/٢٨٣).

٢ هەرش: بەرزاییەکە لەسەر ڕێگای مەککەو لە جوحفەوە نزیکە.

مێشکتی قایم بکە، ئەمجا فەرمانی پێکرد کە بەر لە دەستپێکردنی جەنگ مۆڵەتی سێ ڕۆژ بدە بە عبداللەی کوڕی زوبێر، پاشان وتی: خودایە من لە دوای وتنی ڕستەی شایەتمان (لا إله إلا الله ومحمد رسول الله) هیچ کارێکی گەورەترو گرنگی وام نەکردووە لە کاری کوشتاری خەڵکی مەدینەم بە لاوە خۆشەویستتر بووبێ‌و، بۆ دوارۆژیشم لە ئەو چاکتر جێگای ئومێد بێ، خۆ ئەگەر دوای ئەمە بچمە نێو ئاگرەوە ئەوا دیارە بەدبەخت‌و چارەڕەشم. ئەمجا موسلیم (خوا ڕووی ڕەش کا) مردو لە (مشلل)[1] نێژرا. تەماشاکە چەند گێل‌و نەفام‌و کەودەن بووەو، چۆن پێی وابووە کە بە کوشتنی ئەو خەڵکە لە خودا نزیک دەبێتەوە!، کەسێك سرنج لە پاڕانەوەکەی بدا لەو هۆکارە تێ دەگات کە موسلیمیان وا لێکردووە سەرپەرشتی شەڕەکە بکات‌و هەڵی بسوڕێنێ‌و سیاسەتی (شەلم کوێرم ناپارێزم) ڕەچاو بکات‌و بە ڕاست و چەپدا خەڵك بکوژێت‌و ئاوا زیادەڕۆیی لە خوێنڕشتندا بکات، ئەو پێی وابوو کوشتنی خەڵکی مەدینە بریتیە لە نزیك بوونەوە لە خودا، بۆیە زیادەڕەوی لە کوشتندا کرد، پێی وابوو کوشتنی ئەوان ڕێگای چوونە بەهەشتە، بۆیە زۆری خوێن ڕشت، ئەگەر ئەم ئەحمەقی نەفامە ئەوەندەی پێداگیری لەسەر فەرمانبەرداریکردنی ئەمیری ئیمانداران دەکرد ئەوەندەش پێداگیری لەسەر فەرمانبەرداریکردنی خودا کردبا، چەندەی پێ ناخۆش بوو لە کاتی سەرەمەرگیدا سەرپێچی ئەمیری ئیمانداران بکات، ئەوەندەشی پێ ناخۆش بوو سەرپێچی خودا بکات، لە بەرانبەر بەندەکانی، ئەگەر ئەو دەیزانی کە لە نێوچوونی هەموو دونیا بە لای خوداوە لە ڕژێنرانی خوێنی موسڵمانێك سوك‌و سەلامەترە، ئەگەر ئەوەی دەزانی کە ئەو کردارانەی خەڵکی مەدینە ئەنجامیان داوە هەقی ئەوە نیە لە بەرانبەردا خوێن‌وماڵیان حەڵاڵ بکرێ، بەڵێ ئەگەر ئەو هەموو ئەم شتانەی زانیبان بەکارهێنانی ئەوەندە هێزەی بەس بوو تا خەڵکەکە دەهاتنە ژێر فەرمانی یەزیدەوەو زیادەڕەوی نەدەکرد.[2]

١٠- یەزید چۆن پێشوازی لە هەواڵی جەنگی (الحرة) کرد؟:

کاتێك یەزید هەواڵی دانیشتوانی مەدینەی پێگەیشت کە چ کارێکیان بەسەر هێنراوە، وتی: هاوار بۆ گەلەکەم! ئەمجا زوحاکی کوڕی قەیسی فەهری بانگ کردو پێی وت: نابینی خەڵکی مەدینە چ کارەساتێکیان بەسەر هاتووە؟ بە ڕای تۆ چ شتێك قەرەبوویان بۆ

---

١ المشلل: شوێنێکە لە نێوان مەککەو مەدینەدا، البداية والنهاية (٢٦٣/١١).

٢ الأمويون بين الشرق والغرب (٢٨٥/١).

دەکاتەوە؟ وتی: بەڕێکردنی خۆراکو کەلوپەلو موچە بۆیان. جا فەرمانی کرد بارگەو بنەی خواردنیان بۆ بپێچرێتەوەو پارەو سامانی زۆری بۆ بەڕێ کردن، دیارە ئەمە پێچەوانەی ئەوەیە کە (شیعە) درۆزنەکان وتوویانە کە گوایە: بە گەیشتنی ئەم هەواڵەو کوشتنەیان شادومانو خۆشحاڵ بووەو،[1] لەو دەمەدا لە خۆشیان ئەم شیعرەی (إبن الزّبعري) خوێندۆتەوە:

لیت أشیاخي ببدر شهدوا جزع الخزرج من وقع الأسل

حین حکّت بقباء برکها واستحر القتل في عبدالأشل

وقد قتلنا الضعف من أشرافهم وعدلنا میل بدر فاعتدل

ڕافیزەش ئەم دێڕەیان بۆ زیاد کردووە:

لعبت هاشم بالملك فلا ملك جاء ولا وحي نزل[2]

إبن کثیر دەڵێ: ئەگەر ئەم قسەیە یەزید کردبێتی ئەوا بەر نەفرینی خوداو تەواوی نەفرینکاران بکەوێ، ئەگەر ئەویش نەیکردبێ ئەوا نەفرینی خودا لەو کەسە بێ کە هەڵی بەستووەو بەمە ویستوویەتی ئەوو خەلیفە و پاشاکانی ئیسلامی پێ ناشیرین بکات.[3] إبن تیمیەش قسەی لەسەر ئەم دێڕە شیعرانە کردووەو وتوویەتی: هەموو کەسێکی ژیر دەزانێ کە ئەمە بێ بنەمایەو پوچەڵە.[4] لە ڕاستیدا یەزید کەوتە نێو هەڵەیەکی سامناکەوەو هەرچی پاساوو بەڵگەو بەهانەیەك هەیە خەتەری ئەمەی پێ سووك ناکرێ، فەرمانی حەڵاڵکردنی مەدینە لە لایەن ئەوەوە بۆ ماوەی سێ ڕۆژ تا جەنگاوەران بتوانن تاڵانو برۆی بکەن، سەری کێشا بۆ خراپەیەکی خەتەرناكو شەڕێکی بەربڵاو و، دەرگایەکی لەسەر یەزید کردەوە، تا دزێوو قێزەون بێتو ناوبانگی بزرێتو موسڵمانان ڕقیان لە خۆیو خیلافەتەکەی بێتەوە، بە تایبەتی ئێستا موسڵمانان کوژرانی حوسێن یان لەبیر نەچووبۆوەو هێشتا خوێنی ئەو لە خاکی کەربەلا وشك نەببۆوە ئەم کارەساتەی مەدینەشی بەسەردا هێنان.[5]

---

١ البداية والنهاية (١١/٦٥٥).

٢ البداية والنهاية (١١/٦٣١).

٣ البداية والنهاية (١١/٦٣١).

٤ منهاج السنة (٤/٥٥٠).

٥ الأمويون بين الشرق والغرب (١/٢٨٣).

## چوارەم: گرنگترین وانەو پەند:

١ـ هۆکارەکانی شکستی دانیشتوانی مەدینە:

بزوتنەوەکەی مەدینە هەر لە ڕێوە شکستی هێنا، چونکە ڕیزەکانیان یەك نەخستبوون‌و بە تەنها یەك سەرکردەشیان نەبوو، **هەبوونی چەند سەرکردەیەکیش** لە جەنگدا یەکێکە لە هۆکارەکانی شکست، کاتێك عبداللەی کوڕی عباس پرسیاری لە حاڵی بزوتنەوەکە کرد، وتیان: (عبداللەی کوڕی مطیع)یان کردۆتە سەرکردەی باڵی قوڕەیش‌و (عبداللەی کوڕی حنظلة)شیان کردۆتە سەرکردەی باڵی پشتیوانان–ی مەدینە–، عبداللەی کوڕی عەباس وتی: دوو فەرماندە؟! کەواتە لەنێو چوون.[١] خۆ ئەگەر سەرکەوتن حاصڵ بووایە، ئەوا لەم حاڵەدا هۆکارەکانی ئاشوب خۆیان زەق کردبۆوە، دەوترا: خەلیفە لە کێ بێ؟ پۆستی خیلافەت بدرێت بە کێ؟، پیاوێکی قوڕەیشی یان مەدینەیی؟ خۆڕاشیان نەگەیاندبوو کە سەر بە عبداللەی کوڕی زوبێرن.[٢] **بەرەو کەمی چوونی خواردەمەنی** یەکێکی تر بوو لە هۆکارەکانی شکست، ئەگەر گەمارۆدان ماوەیەکی دوورو درێژی خایاندبایە خەڵك لە برسان لەنێو دەچوون، چونکە ئەو قووتەی لە بازاڕ هەبوو لە چەند ڕۆژێك زیاتر بەشی پێداویستیەکانی خەڵکی نەدەکردو زۆربەی زۆری ئەو خۆراك‌و قوتەش لە ڕێی کاروانی بازرگانییەوە، یان لە کێڵگە کشتوکاڵیەکانی دەرەوەی مەدینەوە دەهێنرا، جا ئەو خەڵکە ئەگەر خواردنیان لێ برابایە لە کوێوەو بە چ ڕێگایەکدا پێیان دەگەیشت، لە حاڵێکدا دەورەی شار گەمارۆ درابێ‌و ڕووبەڕووی سوپای شام وەستابنەوە کە بە چەك‌و ماڵ پشتیوانی گەورەی لێ دەکرێ؟، دەرنەخستن‌و **دیاری نەکردنی ئامانجێك** تا دوابەدوای سەرکەوتنیان‌و لێخستنی یەزید بیپێکن، خۆ ئەگەر ئامانجی ئەوان بە تەنها لێخستنی یەزید بووبێ، ئایا ئەوان ویستوویانە ویلایەتێکی سەربەخۆ دابمەزرێنن؟، بێگومان ئەمە نەگونجاوە، ئەگەر ئامانجیشیان ئەوە بووبێ عبداللەی کوڕی زوبێر بکەن بە خەلیفە، بۆ هەموویان پێکەوەو لەگەڵ ئەودا یەك ئاڵایان بە ناوی عبداللەی کوڕی زوبێرەوە بەرز نەکردبۆوە، لەبەرچی داوایان لێ نەکرد یارمەتیان بدا؟، خۆ ئەگەر سەربازەکانی (عبدالله) هاتبانایە پاڵ سەربازانی مەدینە هێزێکی

---

١ العقد الفريد (٣٨٨/٤)، المدينة في العصر النبوي (ص: ١٣٤).

٢ المدينة في العصر النبوي (ص: ١٣٤).

وا گەورە دروست دەبوو كە دەیتوانی لە بەرانبەر سوپاكەی موسلیمی كوڕی عوقبە ڕاوەستێ، بەڵام ئەوان كاتێك هێزەكانیان تاق كردنەوەو هەر لا بۆ خۆی جەنگی كرد، ئومەویەكان بەم جۆرە بەسەریاندا زاڵ بوون.[1]

٢ـ هەڵوێستی سەرۆكایەتی –ڕوحی– مەدینە:

سەرۆكایەتی (ڕوحی) مەدینەی مونەووەرە لەم شۆڕشە ڕازی نەبوو، لێرەدا دوو بنەماڵەی گەورە لەنێو كۆچەراندا هەبوون كە خۆیان لە دوو بنەماڵەی ئالو خەطابو ئالو هاشمدا دەنواند، نەیاری ڕاو ڕاپەڕینەكەی خەڵكی مەدینە بوون، عبداللەی كوڕی عمر لە سەرووی ئەندامانی ئالو خەطابدا بوو و، بە مامۆستاو براگەورەی هاوەڵانی ئەو سەردەمە دادەنرا، عبداللەی كوڕی عباسو علی كوڕی حوسێنو محمدی كوڕی حەنەفییەش لە كەسایەتییە هەرەبەرزەكانی ئەو كاتی ئالو هاشم بوون.[2]

٣ـ ڕای إبن تیمیة:

بە دەگمەن كەسێك دەست دەكەوێ لە دژی ئیمامێكی حوكمڕان دەرچووبێو بە هۆی ئەو جموجۆڵەی كردوویەتی شەڕێكی زۆر گەورەتر لەو خێرەی كە لێیەوە چاوەڕوان كراوە نەهاتبێتەدی، وەكو ئا ئەوانەی لە مەدینە لە دژی یەزید ڕاپەڕین، ئەوان خۆشیانو هەوادارەكانیشیان شكستخواردوو كرد، نە دونیایان ڕاوەستاو كرد، نە دینیان بەردەوام كرد، خودای بەرزو مەزن فەرمان بە ئەنجامدانی شتێك ناكا بەرژەوەندی دینو دونیای لێ پەیدا نەبێ.. كەسایەتیە مەزنەكانی ئوممەت ڕێگرییان لە خەڵك دەكرد لە كاتی ئاشوبدا لە دژی دەسەڵات دەربچنو جەنگ بكەن، بۆ وێنە: عبداللەی كوڕی عمرو سعیدی كوڕی موسەییەبو عەلی كوڕی حوسێنو چەندین كەسایەتی تری پایەبەرزی شاری مەدینە بەر لە ڕوودانی كارەساتەكەی (الحرة) ڕێگرییان دەكرد خەڵك لە دژی یەزید دەربچن.[3]

٤ـ بایەخدانی مێژوونووسان بە جەنگی (الحرّة):

---

١ المدينة في العصر النبوي (ص: ١٣٥).

٢ المصدر نفسه (ص: ١٣٥).

٣ منهاج السنة (٢/٢٤١).

جەنگی حوڕڕە بە لای مێژوونووسەکانەوە بە قەد هیچ کامێك لە ڕووداوەکانی سەردەمی یەزیدی کوڕی معاویە بایەخی پێ نەدراوە، ئەوان نەهاتوون ئەو جەنگە تاك بکەنەوەو وەکو هەریەکە لە ڕووداوەکانی تر چەند باسێکی تایبەتو سەربەخۆی بۆ تەرخان بکەن، ئەگەر بێتو بەراوردێك لەنێوان ئەو ڕووداوەو بزوتنەوەکەی حوسێندا بکەین دەبینین جیاوازییەکی زۆر لە ئەنجامەکانیاندا هەیە، دەبینین کۆی کوژراوانی جەنگی حوڕڕە دوو هێندەی کوژراوانی گەڵ حوسێن بوو، لە جەنگی حوڕڕەدا پیاوانێکی بەناوبانگو خاوەن پلەوپایەی هاوەڵایەتیو جیهاد کوژران، وەك: عبداللەی کوڕی زەید[١] ئەو کەسەی چۆنیەتی دەستنوێژ هەڵگرتنی پێغەمبەری خودا (ﷺ)ی باس کردووەو، معقل ی کوڕی سنان[٢] کە شاعیر دەربارەی وتوویەتی:

وأصبحت الأنصار تبكي سراتها وأشجع تبكي معقل سنان

هەروەها وێنەی عبداللەی کوڕی حنظلةی غەسیل کە بە خۆیو هەشت کوڕیەوە کوژران، ئا ئەم کەڵە پیاوانە جێگەو پێگەیان لە ئیسلامدا بەرز بوو، بە لەدەستچوونیان موسڵمانان زیانی گەورەیان لێکەوتو تووشی موصیبەتێکی وا هاتن کە خرایە سەر ئەو زیانە گەورەی بە هۆی لە دەستدانی حوسێنی کوڕی عەلی (ڕەزای خوای لێ بێت) لێیان کەوتبوو، (حوسێن) کە لەنێو موسڵماناندا وێڕای ئەوە خاوەن جێگەو پێگەیەکی بەرز بوو، سەروەرو تاجی سەریشیان بوو، بەم جۆرە دەرکەوت کە جەنگی حوڕەش وەك جەنگی کەربەلا کارەساتێکی گەورەو جەرگبڕ بوو.

---

١ عبداللەی کوڕی زەیدی کوڕی عاصمی کوڕی کەعبی ئەنصاری هاوەڵ، لە جەنگی بەدر بەشدار بووەو ٤٨ فەرموودەی گێڕاوەتەوە، الإصابة (٤٦٨٨).

٢ معقلی کوڕی سنانی هاوەڵ، سەرکردەیەکی ئازا بوو، لە جەنگی حونەینو فەتحی مەککەدا ئاڵاهەڵگری هۆزەکەی خۆی بووە.

# باسی پێنجەم

## بزوتنەوەی ( عبداللە ی کوڕی زوبێر ) لە سەردەمی ( یەزید )دا :

عبداللە ی کوڕی زوبێر ﷺ ئامادە نەبوو بەیعەت بە یەزید بدا ،بۆیە بڕیاریدا بچێت لەمەککە ئارام بگرێت.

## یەکەم :هۆکارەکانی هەڵبژاردنی ( مەککە ):

عبداللە بە حوکمی ژمارەیەك هۆکار حەرەمی(مەککە)ی بەگونجاوترین شوێن دانا پەنای بۆ بەرێت و ئارامی تێدا بگرێ: گرنگترینیان ئەمانە بوون:

١ ـ لەقۆناغی ئێستادا هەرێمی (مەککە) بەپێچەوانەی هەرێمەکانی تر لەبارترین هەرێمە بکرێتە پەناگا، (عێراق) بە هەردوك شارەکەیەوە (کوفەو بەسرە) دانیشتوانەکەیان بۆ دالدەدانی هەر سەرکردەیەکی بەرهەڵستکاری دەسەلاتی بەنی ئومەییە جێگەی پشت پێ بەستن نین ، ئەوەی بەسەر حوسێنیان هێنا باشترین بەڵگەی ئەم قسەیە مانە، عبداللە بەباشی لەمە حاڵی ببوو، ئەم حاڵی بوونەشی لەکاتی ئامۆژگاریەکانی دەردەکەوێت بۆ حوسێنی کوڕی عەلی، کاتێك پێی گوت: مەچۆ بۆ عێراق.[1] پێی گوت: بۆ کوێ دەچی؟! بۆ لای گەلێك باوکتیان کوشت‌و بە کوشت ڕمبیان لە براکەت دا؟!. (میصرو یەمەن)یش: لە گۆڕەپانی ڕووداوەکان دوربوون ئەمە لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە ئێستا لەم دوو هەرێمەدا پشتیوان ولایەنگری بۆ دروست نەبوون .(شام)یش - وەك زانراوە پایتەخت وقەلای ئومەویەکانە.

٢ ـ (مەککە) - بەهۆی بوونی (کابەی پیرۆز) لەوێدا - وڵاتێکی حەرامەو دروست نیە بە هیچ پاساوێك هێرشی بکرێتە سەر وخوێنرێژی تێدا بکرێت، کەواتەئەمە کەفیلە بۆ پاراستنی کەسانێك بیانەوێ بیکەنە پەناگای خۆیان وخۆی پێ لەکوشتن دەرباز بکەن، مەگەر کەسێك تاوانێکی وای کردبێ واجب بێ بکوژرێتەوە تیایدا، بیرکردنەوە لەبەکارهێنانی هێز بەلانی کەمەوە دەبێ وەك دواچارە سەرێر بکرێت بۆ ئەو حوکمە تایبەتیە.

٣ ـ (مەککە) ڕێزو وپیرۆزی تایبەتی خۆی هەیە لەنێو دڵ ودەروونی موسڵمانانداا؛ لەبەر ئەوە هەرکەسێك بیەوێ بێڕێزی بەرامبەر بنوێنێ وزیانێکی پێ بگەیەنێ، ئەوا لەلایەن موسڵمانانەوە ڕووبەڕووی بەر هەڕلستکاریەکی توند دەبێتەوە. عبداللە سوودێکی زۆری لەم خاڵە وەرگرت.

---

١ـ نسب قريش ص٢٣٩ للزبيري .

٤ ــ سالآنە لەوەرزی (حەج)دا موسڵمانی زۆر لەم سەرەوسەری جیهانی ئیسلام ڕوو لە(مەککە) دەکەن، بە هۆیەوە دەتوانرێ ڕای گشتی کاری لەسەر بکرێت و ئاراستە بکرێت، ئەمەش جگە لە (مەککە) لە هیچ هەرێمێکی تر دەستەبەر ناکرێت.

٥ ــ (مەککە)بە کۆچکردنی پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی لەوێڕا بۆ مەدینە ڕۆڵی سیاسی خۆی لە دەستدابوو، لەبەر ئەمەو بە پێچەوانەی (مەدینە) دەسەلآتی ئومەویەکانیشی تێدا بەهێز نەبوو.

٦ ــ بزووتنەوەکەی عبداللە بەزۆرینەی خەڵکی مەدینەوە پەیوەشت بوو، کە لەدژایەتیکردنی حوکومەتی بەنی ئومەییە هاو هەڵوێستی ئەو بوون ، کەواتە بەخاتری پەیوەندیکردنی خێرا پێیانەوەو مسۆگەرکردنی پشتیوانی ئەوان بۆ خۆی وا بۆ عبداللە گونجاوە لە مەدینە نزیك بێت.[١]

## دووەم :هۆکارەکانی دەرچوونی عبداللەی کوڕی زوبێر:

ئامانج لەدەرچوونی عبداللەﷺو ئەوانەی لەگەڵیدا بوون ـ کە لەنێویاندا ژمارەیەك هاوەڵ وتابیعی هەبوون وەك (میسوەری کوڕی مەخرەمەو عبداللەی کوڕی سەفوان وموسعەبی کوڕی عبدالرحمن ی کوڕی عەوف وژمارەیەکی تر لەڕێزدارانی ئەو سەردەمە) گۆڕینی واقیع بوو بە زەبری شمشێر، واقیعێك کەخیلافەت وحوکمڕانی تێدا چوو بووە قۆناغی پاشایەتی ومیراتگری، هەواڵگەلێکی زۆریش دەربارەی یەزید بڵاو ببوونەوە کە ڕەنگڕووی خەلیفەی ئومەویانی لەشام بەناشیرین نیشان دەدا.

لێرەدا پێویستە تێ بگەین: عبداللە لەبەر خودا ڕاپەڕی، نەك بۆ شتێکی تر، خەڵکانێکی وەك (مەحەممەد ماهر حمادە) دەڵێن گوایە: لەگەڵ ئەوەدا بزووتنەوەکەی لەتێکەڵەیەکی چەند ڕەگەزی سەر سوڕهێنەر پێکهاتبوو، ئەوا هەوای کەڵلەو ڕق وکینەی دڵ هەڵیان دەسوڕاند، کەلەکەسایەتی ودەروونی عبداللە دا خۆیان دەنواند.[٢]

بێگومان ئامانجی بزووتنەوەکەی: گێڕانەوەی ئۆممەت بوو بۆ ژیانی شوراو ڕاوێژو، لەلایەن باشترینی ئەندامەکانیەوە حوکمڕانی بکرێت، دەترسا جێنشینایەتی ببێتە پاشایەتی؛ بۆیە بەلایەوە بەکارهێنانی هێز لەلابردنی خراپەدا لەخودای نزیك دەکاتەوەو سنورێکیش بۆ

---

١ــ عبدالله بن الزبير والأمويون ص٧٠،٧١ عبدالله بن عثمان .

٢ــ الوثائق السياسية للجزيرة العربية ص١٨ .

گواستنەوەی سیستەمی جێنشینایەتی بەرەو سیستەمی پاشایەتی دادەنێت، هەر لەبەر ئەمە بوو تا (یەزید) نەمرد بانگەشەی بەیعەتی بۆ خۆی نەکرد.[١]

عبدالله وتاری دەداو دەیگوت: سوێند بەخودا، جگە لە چاکسازی و هەستاندنەوەی هەق چی ترم ناوێ، من نامەوێ ماڵ کۆکەمەوەو بەسەمەندەی بکەم.[٢] دەیگوت: خودایە گەیشتن بەتۆم پێخۆشە، تۆش گەیشتن بەمنت لاخۆش بێ، شەڕم لەگەڵ دوژمنی تۆ کردووە، تۆش پاداشتی موجاهیدانم پێ ببەخشە[٣]، عبداللەی کوڕی سەفوانی کوڕی ئومەییە بە عبداللە ی دەگوت: وەڵلاهی من بەهاوشانی تۆ نەجەنگاوم تەنها لەپێناوی دینەکەمدا نەبووبێ.[٤]

لەمبارەوە گێڕانەوەی زۆرو ڕاست هەن، دەکرێ بیانکەینە بەڵگە بۆ هەقانیەتی بزووتنەوەکەی ، لەلایەکی ترەوە دانیشتوانی (مەدینە) پێیان وابوو ئەم بزووتنەوەیە جیهاد کردنە لەپێناوی خودادا.[٥]

دەرچوونی حوسێنی کوڕی عەلی وعبداللەی کوڕی زوبێرو ئەهلی (حەرڕە) ﷺ (خودا لێیان ڕازی بێت) لە پێناوی گێڕانەوەی شوڕادا بووە، بەپێ ی ئەم بەڵگە شەرعیانە:

١ ـ بەرگریکردن لەو مافەی خودا پێیداون: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ﴾ (الشورى: ٣٨)، واتە: کاروبار بەڕێوەبردن لەنێو خۆیاندا بە شوڕایە.

٢ ـ زەوتکردنی پۆستی حوکمڕانی ستەمەو واجبە نەهێڵرێ.

٣ ـ دەستگرتن بەسوننەت و ڕێبازی خەلیفە ڕاشیدەکان لەبواری حوکمڕانیدا.[٦]

چەند شتێك بوونە هاریکار بۆ هێنانەدی ئامانجەکانی عبداللە و کۆبوونەوەی خەڵك لەدەورەی، لەوانە:

کاردانەوەی کارەساتی کەربەلا، بە خراپ دەرکەوتنی ناسنامەی یەزید، تاڵوکە کردنی یەزید لەلابردنی والیەکانی وڵاتی حیجاز لەسەر پۆستەکانیان، حیجازێك کەچەقی قورسایی سیاسی بوو لە سەردەمی پێغەمبەرو خەلیفە ڕاشیدەکان.[٧]

---

١ـ الطبقات (١٤٧/٥) .

٢ـ أنساب الأشراف (٣١٥/١) .

٣ـ تأريخ إبن عساكر، نقلاً عن عبدالله بن الزبير والأمويون ص٦٧ .

٤ـ أخبار مكة للفاكهي (٣٦٤/٢) .

٥ـ عبدالله بن الزبير والأمويون ص٦٧ .

٦ـ الحرية أو الطوفان ص١٢٤،١٢٥ .

٧ـ عبدالله بن الزبير د.شحادة الناطور ص٩٦_٩٨ .

## سییەم: هەوڵە ئاشتیەکانی یەزید بۆ گێڕانەوەی عبدالله ی کوڕی زوبێر:

عبدالله زۆری بەگوێ ی حوسێن دا خوێند تا دەرنەچێ بۆ کوفە، پێ ی گوت: بۆ کوێ دەچی؟!، بۆ لای گەلێك دەڕۆی باوکتیان کوشت وبراکەتیان کردە نیشانەی ڕمبی خۆیان.؟!.[1]

ئەم هۆشداریەی دا بەحوسێن؛ چونکە هەستی پێکردبوو حوسێن دەکەوێتە حاڵەتێکی ترسناکەوە، دەشیزانی ئەگەر حوسێن لەعێراق تووشی لەنێو چوون ببێ، ئەوا ئەنجامەکان بەدژی ئەو دەشکێنەوەو خۆیو بزووتنەوەکەی ئەویش لەمەیداندا تاك دەبێتەوەو بەئاسانی کۆتایی پێ دەهێنرێ؛ لەبەر ئەمە زۆری هەوڵدا: حوسێن هەست بەگرنگی جێگەو پێگەو ڕێزو پایەی خۆی بکات ـ لەحیجازداو ـ ئەگەر لەمەککە بمێنێتەوە هەموو دانیشتوان لەسەرووی هەموشیانەوە عبدالله قەدری تەواوی دەگرن وپشتیوانی دەکەن، بۆیە زۆر دلێرانەو بوێرانە ڕای خۆی بۆدەربڕی و گوتی: ئەگەر دەتەوێ لێرەبی لێرە بمێنەوەو مەڕۆ، ببە براگەورەو ئەمیرمان، پشتگیری و هاریکاری تەواوت دەکەین، دڵسۆزیت بۆ دەنوێنین و بەیعەتت پێ دەدەین.[2]

بە ڕای عبدالله لەسۆنگەی ئەوە: حوسێن خاوەن پلەو پایەو جێگای تایبەتە لای موسڵمانان وڕێزو ستایشێکی بێ ئەندازەی هەیەو کەس لەم بوارەدا پێ ی ناگات؛ ئەوا دەیەوێت سەرکردایەتی گشتی بەدەست حوسێنەوە بێت، لەلایەکی ترەوە بەحوکمی ئەوە خۆی خاوەن بەشێکی باشە لەبەشداریکردنی هێرشی سەربازی سەرکەوتوانەی گۆڕەپانی جیهادو فەتحی ئیسلامی، پێی باشە نەخشەو پیلانی ڕووبەڕوو بوونەوەی لەبەرامبەر یەزیدی کوڕی معاویە بەدەست خۆیەوە بێت.

عبداللە پێی چاك بوو وڵاتی حیجاز بکاتە مەڵبەندی وەرچەرخان و پەلهاویشتنی بزووتنەوەی بەرهەڵستکاری؛ چونکە دانیشتوانەکەی ڕاستگۆ ـ یەو خاوەن بەڵێنەو خودا پەرست وچاکە خوازەو زانایانی هاوەڵ وشوێنکەوتووە گەورەکانی لێن و، بوونی هەردوك حەرەمی (مەککەو مەدینە)ش ڕێزو پێگەی تایبەتی خۆیان لەنێو دڵو دەروونی موسڵماناندا هەیە، کەواتە ئەگەر دەسەڵاتی تەواویان بەسەر حیجازدا پەخش بوو، ئەوا بزووتنەوەکەیان چەندین هەنگاوی گەورە دەهاوێ بۆ هەرێمەکانی تری جیهانی ئیسلامی، کاتێکیش

---

١ـ مصنف بن أبي شيبة (١٥_١٩) بسند حسن .

٢ـ أنساب الأشراف (١٣/٤)، موافق المعارضة ص٥١٨ .

موسڵمانان بۆ حەج و عومرە هاتنە حیجاز بێگومان هەواڵی هـەردوك بەرهەڵستکار (حوسـێن وعبداللـه)و چـێگەو پێگـەی ئـاینی وسیاسـی وکۆمەڵایـەتی ئـەوان دەگەیـەنن بەخـەڵکی هەرێمەکانیان، ئەمـەش سەردەکێشێ بـۆ ڕاکێشانی سـرنجی دانیـشتوانی هەرێمـەکان و زۆر بوونی پشتیوانانیان.

کاتێك حوسێن ﷺ بەرەو کوفە ڕۆیـشت ولـەڕۆژی عاشـوڕای ٦١ك لەکەربـەلا کـوژرا، ئـەم کارەساتە کاریگەری گەورەی لەسەر عبدالله و بزووتنەوەکەی دروستکرد، ئەو شتەی عبدالله لێ ی دەترسا ـ لەخۆ تەنها کردنی ئومەویەکان بەئەوەوە ـ هاتەدی، پاشان ئەو کەسەی ڕێزو چێگەو پێگەی بۆ بزووتنەوەکە زۆر کردبوو کوژرا، لەگەڵ ئەمەشدا کەس ورتەی لێنەهات وبۆ حوسێن نەجۆشاو لەدژی ئومەویەکان ڕانەپەڕی.[1]

لەوانەیە ئەم تاکبوونەوەی عبدالله لـە گۆڕەپـانی دژایەتیـدا وای لـەئیبن خەلـدون کردبـێ بڵێ: کەس لە دژایەتیکردنی ئەم پەیمانە ـ ی جەماوەری موسڵمانان لەسەری یەکدەنگ بوو ـ نەمایەوە جگە لەئیبن زوبێر، دیارە کەسێکیش بـە تـاق‌و تـەنیا لـە سـەنگەری دژایەتیکردنـدا بمێنێتـەوە، عەنتیکـەبوونی دەردەکـەوێ‌و دەناسـرێ.[2] عبداللـە هەسـتی بەهەڵوێـستە مەترسیدارەکەی کرد، بەڵام هەوڵیدا سوود لە هەموو ئەو ڕق وکینە وەربگرێت کـە لەسـوێ ی کوژرانی حوسێن لەدڵ و دەروونی موسڵمانان بەرانبەر ئومەویەکان پەنگی خواردۆتەوە.[3]

١ ـ یەکـەمین هێرشـی ڕاسـتەوخۆو ڕاشـکاوی عبداللـە ﷺ لـەدژی یەزیـد: ئـەو کاتـە بـوو هەواڵی کـوژرانی حوسـێن ﷺ ی بیـست، هەسـتایە سـەر پـێ ولـەنێو ئـاپۆرای جـەماوەردا و تارێکی کاریگەری خوێندەوەو، پەرۆشی خۆی بۆ حوسێن دەربڕی، سەرزەنشتی بکوژەکـانی کردو گوتی: بەخوا کەسێکیان کوشتووە؛ شـەونێژی زۆری هـەبوو، ڕۆژگـاری ژیـانی بـەڕۆژوو بوو، شایانتر بوو لەئەوانە بۆ حوکمڕانی، لەپێش ئەوەوە بوو لە دینـداری وچـاکەدا، قەسـەم بەخوا: قورئانخوێندنی بەگۆرانیگوتن و گریان لەترسی خودای بە بالۆرەو حـەیران و بـەڕۆژوو بوونی بەمەی خواردنەوە نەگۆڕیبۆوە، لەجیاتی دانیـشتن لـەکۆڕی زیکـر نەدەچـووە دەشـت ودەر خۆی هەڵباوێ بۆ نێچیر (فسوف یلقون غیاً).[4]

---

١ـ موافق المعارضة ص٥١٩ .

٢ـ مقدمة إبن خلدون (٤٦٥/١) .

٣ـ موافق المعارضة ص٥٢٠ .

٤ـ موافق المعارضة ص٥٢٠ .

هەست وسۆزو پەرۆشبوونی زۆری خەڵکی حیجاز بەگشتی بۆ حوسێنﷺ پاڵی پێوەنان بەیعەتی پێ بدەن[١]، عبداللەﷺ تێبینی کرد دانیشتوانی حیجاز دڵ ودەرونیان پڕبووە لەداخو ڕق وکینە ـ لەدژی ئومەویەکان ـ بەهۆی کوژرانی حوسێنﷺ لەلایەن ئەوانەوە؛ بۆیە خەڵکی بۆ حوکمی شورا بانگهێشت دەکرد ، ڕەخنەی لەیەزید دەگرت وقسەی پێ دەگوت[٢]، دەیگوت: (یەزید دەخواتەوە)، خەڵکی لێ سارد دەکردەوە، کۆبوونەوەی بەخەڵکی دەکردو بەدوور ودرێژی خراپەکانی (بەنی ئومەییە)ی بۆ باس دەکردن.[٣]

٢ ـ هەوڵە ئاشتی یەکانی یەزید: یەزید لەسەرەتادا نەیویست کارێك بکات کێشەکە لەگەڵ عبدالله قوڵ بکاتەوە ؛ بۆیە سەرەتا نامەیەکی بۆ نارد، کە لە نێویدا پەرێزو شوێنەواری کردەوە چاکەکانی بۆ دەخاتە ڕوو، کە لەژیانیدا ئەنجامیداون، ئەمجا ئاگاداری دەکات لەهەڵایساندنی فتیلەی فیتنەو ئاژاوە، بەشێکی نامەکە ئاوایە: خودات وە بیر دەخەمەوەو، بەخۆت دابچۆوە، تۆ یەکێکی لەپیاوە بەتەمەنەکانی قورەیش، مێژوو وپێشینەیەکی باشت لەکردەوەی جواندا هەیە ، چەندین هەنگاوی ڕاست ودروستت لەبواری پەرستن و فتوادا هەڵێناون، لەکردەوە جوانەکانی پێشدات زیاد بکە، کارێك مەکە کارەکانی پێشداشت بباتەوە هیچە، وەرە نێو ئەو بازنەی خەڵك هاتۆتە نێویەوە، خەڵك بەرەو ئاژاوە مەبە، حەرامی خودا حەڵاڵ مەکە. ئەویش وەڵامی نەدایەوەو بەیعەتی پێ نەدا.[٤]

٣ ـ یەزید لە عبدالله تووڕە دەبێ: عبدالله وەڵامی بانگەشەکەی یەزیدی نەدایەوەو بەیعەتی پێ نەدا ، بۆیە یەزید سوێندی خوارد نابێ بەیعەتی لێ قبوڵ بکات تابە کۆت وزنجیرکراوی بۆلای نەهێنن.[٥] معاویەی کوڕی یەزید زۆری هەوڵدا باوکی سوێندەکە بشکێنێ، چونکە عبدالله ی دەناسی کەقبوڵ ناکات بەکۆت وپێوەندەوە بێتە لای یەزید، (معاویەی کوڕی یەزید): پیاوێکی باش و لەخواترس وخۆبە کەمزان و ئاشتیخوازو تەبا بوو ودەترسا خوێنی موسڵمانان بەدەستی یەکتر بڕژێ، (عبداللەی کوڕی جەعفەر) لەم بارەوە هاوکاری معاویەی کرد، بەڵام یەزید لەسەر ڕایەکەی خۆی سوور بوو. معاویە لەپێناو خاوبوونەوەی یەزیدی باوکی لەهەڵوێستە توندەکەی، هەستا دەکەسی لەپیاو ماقوڵانی وڵاتی شامی

١ـ أنساب الأشراف (٣٠٤/٤) .

٢ـ هەمان سەرچاوە.

٣ـ أخبار مكة (٢٠١/١)، بسند كل رجاله ثقات .

٤ـ أنساب الأشراف (٣٠٣/٤،٣٠٤) .

٥ـ أنساب الأشراف (٣٠٤/٤)، أخبار مكة (٣٥١/٢) إسناده حسن .

بەکۆتو پێوەندێکی زیوو وپۆشاکێکی باڵا پۆشی چنراو لەخوری وئاوریشم بەرەو(مەککە) بۆ لای عبداللـه بـەڕێکرد.[١] لەگێڕانەویـەکی تـردا: یەزیـد زنجیرێکـی زیـوو کەلەپـچەیەکی زێـڕ و کۆتوپێوەندێکی زیوی بۆ ئیبن زوبێر نارد.[٢] وەفدەکە گەیشتە (مکة)، ئیبن عوزاتی ئەشعەری دەستی بەقسە کردو گوتی: ئـەی ئـەبو بـەکر! هەرچەند پـەرێزی کردەوەجوانـەکانت لەبـەر چاوە؛ لەکاتی پشتیوانیت لەخەلیفەی ستەملێکراو لەڕۆژانی گەمارۆدرانیـدا ئـەم هەڵوێـستەت قابیلی فەرامۆش کردن نیە، بەڵام یەزیدی ئەمیری ئیمانـداران تـووڕە بـووە لەبەرامبـەر وەڵام نەدانەوەت لە نوعمانی کوڕی بەشـیری نوێنـەری بـۆ بەیعەتـدان، سـوێندی خـواردووە دەبـێ بەکۆتو پێوەندێکی سووکەوە بێیتە لای وسوێندەکەی بەرەسەر، پۆشاکێکی بەسـەر دابکـەو کەس کۆت و پێوەندەکە نابینێ، بزانە تۆ تاکـە کەسـێکی بـەرزو بـەرێزی و لەلایـەن ئـەمیری ئیماندارانەوە بە تایبەت داواکراوی، سەبارە بە هـەچ شـتێك لـە دەسـەڵات وسـەرمایەت بـوێ ناڵێ نا.[٣]

٤ ـ عبدالله بیردەکاتەوەو ڕاوێژ دەکات: ئیبن زوبێر مۆڵـەتی چـەند ڕۆژێکـی لەوەفدەکـە خواست تا بیربکاتەوەو ڕاوێژ بکات، چووە لای ئەسمائی دایکی و داواکەی یەزیدی بۆ خـستە ڕوو، گـوتی: ڕۆڵـەگیان بـەرێزو حورمەتـەوە بـژی وبـەرێزو حورمەتـەوە بمـرە، خـۆت مەخـە دەست(بەنی ئومەییە)و گاڵتەت پێ بکەن، مردن لەم حاڵە باشتر.[٤]

هاوکات لەگەڵ ئەمەدا، (مەڕوانی کوڕی حەکەم) (عبدالعزیز)ی کوڕی بۆلای عبدالله ناردو گوتی: پێ ی بڵێ: باوکم خاتری تۆی ویستووەو بۆ پاراستنی ڕێزو حورمەتت منـی بـۆلای تـۆ ناردووەو،تکات لێ دەکا سوێندەکەی ئەمیری ئیمانداران بەرەسـەر، تـەنها کۆتـو پێوەنـدێکی سـادەت تێـوە دەپێـچرێت و پۆشـاکێکی سـەرتاپای بەسـەردا هەڵکێـشە، نابینرێـت وکـەمێك زرینگەی لێوە دێت، ئیبن زوبێر سوپاسنامەیەکی بۆ مەڕوان ناردەوە.[٥] دوای ئەمـە وەڵامـی وەفدەکەی بەنەرێ دایەوە.[٦]

---

١ـ تأريخ خليفة ص٢٥١ إسناده حسن، موافق المعارضة ص٥٢١ .

٢ـ الآحاد والمثاني (٤١٦/١) بسند صحيح لبن آبي عاصم .

٣ـ أنساب الأشراف (٣٠٨/٤)، موافق المعارضة ص ٥٢٣ .

٤ـ أخبار مكة(٢٠١/١) بسند كل رجاله ثقات .

٥ـ نسب قريش ص٤٤٩، موافق المعارضة ص٥٢٤ .

٦ـ موافق المعارضة ص٥٢٤ .

٥ ـ هەڕەشەی وەفد لە عبدالله و وەڵامدانەوەی: دوای وەڵامدانەوەی وەفدەکە بەنەخێر، عبدالله ڕووبەڕووی ئیبن عوزاتی سەرۆکی وەفدەکە گوتی: وێنەی من وێنەی یەك لە کۆترەکانی حەرەمە، ئایا تۆ ئامادەی کۆترێك لەکۆترەکانی حەرەم بکوژی ؟ ،گوتی: بەڵی، بەهای کۆتری حەرەم چەندە؟ هاکورە: تیرو کەوانەکەم بۆ بێنە، بۆی هێنا، تیرێکی خستە نێو چەقی کەوانەوە، ئەمجا بەرەو کۆترێکی حەرەم سێرەی گرت ، گوتی: ها کۆتر: یەزید مەی دەخواتەوە؟ بڵێ (بەڵێ) ، بەخوا ئەگەر وابڵێی تیرەکەت تێ دەگرم!، هۆ کۆتر: یەزیدی کوڕی معاویە لەخەلیفایەتی دەخەی و لەئوممەتی محمدﷺ جودا دەبیتەوەو لەحەرەم جێنشین دەبی تاخوێنت حەڵاڵکەی؟، بەخوا ئەگەر وابکەی تیرت تێدەگرم. عبدالله گوتی: هاوار بۆ تۆ! باڵندە قسە دەکا؟ گوتی: نا، بەڵام خۆ تۆ قسە دەکەی، سوێند بێ بەخوا بەخۆشی بێ یان بەناخۆشی دەبێ بەیعەت بدەی، دەنا ئاڵای ئەشعەریەکان لەم دۆڵ و دەشتە بە شەکاوەیی دەبینی، ئەگەر بریارماندا شەڕت لەگەڵ بکەین، تۆش چویە نێو(کەعبە)وە یان بەسەرتیدا دەروخێنین یان دەیسوتێنین ، عبدالله گوتی: ئایا حەرەمی بەیتو لحەرام حەڵاڵ دەکەی؟! ، گوتی: ئەو کەسە حەڵاڵی دەکات لەنێویدایەو لەهەق لادەدات وستەم دەکات.[١] عبدالله گوتی: بەیعەتی یەزیدم لەئەستۆ دانیە، ئیبن عوزات گوتی: هۆ هۆزی قورەیش، گوێتان لێبوو چی گوت، خۆ ئێوە بەیعەتتان داوە، ئەوە فەرمانتان پێ دەکا پاشگەز ببنەوە.[٢] عبدالله باسی نەنگی وکەمو کوریەکانی یەزیدی کردو گوتی: بەیانی هەڵدەستێ سەرخۆشە، ئێوارە دەیبینی سەرخۆشە، ئەمجا گوتی: ئەی ئیبن عوزات، من قەت بە ترسنۆکی لەخەو هەڵنەستاوم، من بەرۆشنایی ورێنمایی پەروەردگارم بەرێگادا دەرۆم، من بکوژرێم باشترە لەوەی تۆ دەیڵێ ی، ئەگەر بەمردنی ئاسایش مردم: خودا چاك دەزانێ چەندەم پێناخۆشە گوناهو تاوان لەسەر زەوی ئەودا ئەنجام دەدرێن . خەڵکەکەی تریش وەکو عبدالله وەڵامی وەفدەکەیان دایەوە.[٣] عبدالله گوتی: خودایە من پەنابەری ماڵەکەتم [٤] ، نازناوی خۆی بە(عائذ اللە) واتە پەنابەری خودا دەرکرد[٥]، بۆیە دوای ئەمە بە(عائذ) پەنابەر ناوی دەرکرد.[٦]

---

١ـ أنساب الأشراف (٣٠٩/٤) .

٢ـ عيون الأخبار (١٩٦/١) .

٣ـ أنساب الأشراف (٣٠٩/٤) .

٤ـ موافق المعارضة ص٥٢٥، نقلاً عن إبن عساكر .

٥ـ الإصابة (٤٩/٤) سند صحيح .

٦ـ تأريخ الطبري، نقلاً عن موافق المعارضة ص٥٢٥ .

## چوارەم: هەوڵە جەنگیەکان لەدژی ئیبن زوبێر:

١ – هێرشی (عەمرۆی کوڕی زوبێر):

یەزید بڕیاریدا دەبێ هێرشێکی سەربازی بکرێتە سەر عبداللە و یەکێك لەم دوو ئامانجەی بپێکێ: دەستگیرکردنی یان لەنێوبردنی، ئەگەر دەستگیر کرا ئەوا دەبێ بەکۆت وزنجیر کراوی وملبەستراوی بهێنرێتو سوێندەکەی یەزید بچێتە سەر.

لەم ساڵەدا ـ کەڕاست وایە ٦١ کۆچی بووبێ (عەمرۆی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص)ی والی مەدینە حەجی کرد، عبداللە ش حەجی کرد، بەڵام نەنوێژی لەدوای (عەمرۆ)ەوە کرد، نە لە(عەرەفە)ش شوێنی کەوت.[1]

عبداللە بەم هەڵوێستەی نیشانیدا: کەدان بەم دەوڵەتەدا ناهێنێت ولیّ ی جودایەو سەر بەخۆیە؛ چونکە ڕاپەڕاندنی مەناسیکی(حەج) وەك ڕاپەڕاندنی کاروباری جیهاد دەبێ دەوڵەتی شەرعی ڕایپەڕێنێ، کە ئەو مەناسیکی حەج بەپێشەوایەتی کاریەدەستی خەلیفە ئەنجام نادات، واتای ئەوەیە دەوڵەتەکە ناشەرعیە.[2]

پاش ئەمە (حاریسی کوڕی خالیدی مەخرومی)ی کەجێگری (عەمرۆی کوڕی سەعیدی بوو لە مەککەدا) ،لە لایەن عبداللە وە پێشنوێژیکردنی نێو حەرەمی لێ قەدەغە کرا[3]. ئەمجا سەر بەخۆیانە هەڵسوکەوتی دەنواندو، بۆ دەرکردنی بڕیارو فەرمانیش ڕاوێژی بە(میسوەری کوڕی مەخرەمە)[4] و (موسعەبی کوڕی عبدالرحمن ی کوڕی عەوف) و (حەبیری کوڕی شەیبە)و (عبداللەی کوڕی سەفوانی ئومەییە) دەکرد، ئاڕاستەی دەکردن کە کاروبار لەنێویاندا بەڕاوێژە، سەرپەرشتیو ئیمامەتی نوێژەکانو هەینیەکان وڕاپەڕاندنی مەناسیکی حەجی پێ دەکردن.[5]

یەزید نامەیەکی بۆ عەمرۆی کوڕی سەعید نارد، فەرمانی پێکردبوو: هێزێکی سەربازی هێرشبەر ساز بکات، ئەویش فەرمانەکەی جێبەجێکردو (عەمرۆی کوڕی زوبێر)ی کردە فەرماندەی سوپاکە، جێی باسە (عەمرۆی کوڕی زوبێر) سەرۆکی دەزگای ئاسایشی مەدینە بوو، دژایەتی توندی (عبداللە)ی برای دەکرد، لایەنگران و هاوسۆزانی ئەوی دەگرت

---

١ـ أنساب الأشراف (٤/٤٠٧) .

٢ـ موافق المعارضة ص٥٢٦ .

٣ـ تأريخ إبن عساكر (٣٠/٢٠٠) .

٤ـ التقريب ٥٣٣ .

٥ـ تأريخ إبن عساكر (٣٠/٢٠٠)، موافق المعارضة ص٥٢٧ .

ویەرشەلاقی دەدان، لەو كەسانەی عەمرو شەللاقی لێدابوون: (مونزیری كوڕی زوبێر، محمدی كوڕی مونزیری كوڕی زوبێر، عبدالرحمن ی كوڕی ئەسوەری كوڕی عەبد یەغوس[١]، عوسمانی كوڕی عبداللەی كوڕی حەكیمی كوڕی حیزام[٢]، خوبەیبی كوڕی عبداللەی كوڕی زوبێر).[٣] ژمارەیەكیش لەترسی عەمرو مەدینەیان بەجێهێشت و بەرەو مەككە ڕۆیشتن و خۆیان گەیاندە ئیبن زوبێر، لەو پەنابەرانە: عبدالرحمن ی كوڕی عوسمان و عبدالرحمن ی كوڕی عەمری كوڕی سوهەیل.[٤] دەڵێن (عەمروی كوڕی زوبێر) بۆ خۆی داوای كردووە سەركردایەتیكردنی سوپا هێرشبەرەكەی پێ بدرێ[٥]، سوپاكە ڕێكخراو، لەهەزار كەس پێكهاتبوو وبەرەو مەككە ملی لێنا، عەمرو (ئەنیسی كوڕی عەمری كوڕی ئەسلەمی) بەحەوتسەد سەربازەوە بەرەو باری پێشەوە بەڕێكرد[٦]، ئەنیس و هێزەكەی لە(ذي طوى) جێگیر بوو، بۆ خۆشی لەگەڵ باقی سوپاكە ڕۆیشت تا گەیشتە (الأبطح).

عەمرو نوێنەری خۆی ناردە لای عبدالله و داوای لێكرد سوێندەكەی یەزید بباتە سەرو كارێك نەكات شەڕو ئاژاوە لەولاتی حەرەمدا دروست ببێ.[٧] لەماوەی گفتوگۆدا عەمروی كوڕی زوبێر لەسەربازگەكەی دەهاتە دەرەوەو دەهاتە مزگەوتی حەرام و پێشنوێژی بۆ خەڵك دەكرد، عبداللەی براشی لەدوای ئەوەوە نوێژی دەكرد! عبدالله پیاسەی لەگەڵ عەمرو دەكردو بەگفتوگۆی نەرم وشیرین دەیدواندو پێ ی دەگوت: من گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری خودام، بەلام تۆ كار بۆ یەزید دەكەی! ، نوێژت لە دوا دەكەمو ناكۆك نیم لەگەڵت، بەلام: لەوەدا (گەردنبەندم لەمل كەیت و بەرەو شامم بەڕێبكەی)، بەقسەت ناكەم، چونكە بیرم لێكردۆتەوە و گەیشتومە ئەنجامێك، كە نەحەلالە و نەدروستە خۆم بەدەستەوە دەم و خۆم تووشی داماوی و سەرشۆڕی بكەم، بۆلای سەرۆكەكەت بگەڕێوەو ڕای منی بۆ بنووسە، بەلام عەمرو نەهاتە ژێرباری داواكەی عبدالله و نامەی بۆ یەزید نەنووسی، بە پاساوی ئەوە كە ئەو هاتووە فەرمانێكی دیاریكراوی ئەو جێبەجێ دەكاتو بەس.

---

١ـ نسب قريش ص٢١٤،٢١٥ .

٢ـ هەمان سەرچاوە ص٢٣٣ .

٣ـ هەمان سەرچاوە ص٢٣٩،٢٤٠ .

٤ـ الطبقات (١٥٨/٥) .

٥ـ أنساب الأشراف (٣١٢/٤)، موافق المعارضة ص٥٢٨ .

٦ـ تأريخ الطبري، نقلاً عن موافق المعارضة ص٨٢٥ .

٧ـ تأريخ الأسلام (حوادث ٦١ـ٨٠) ص١٩٩ .

دوای کۆتاییهاتنی ماوەی گفتوگۆ: ئیبن زوبێر، عبداللەی کوڕی سەفوانی جەمەحی بەپۆلێك سەربازەوە ناردو، لای خوارەوەی (مەککە)یان گرت و، نەغافڵ گەمارۆی هێزەکەی (ئەنیسی کوڕی عەمری سەلەمی)یان داو ئەنیس کوژراو، هێزەکەشی تێکشکا.

لەهەمان کاتدا: (موسعەبی کوڕی عبدالرحمن ی کوڕی عەوف) سەرکردایەتی هێرشێکی کرد بۆسەر سەربازگەکەی (عەمرۆی کوڕی زوبێر) لە(ئەبتەح) دەرەنجام هێزەکەی عەمرو شکا، خودی عەمرو ش خۆی بەماڵی (عەلقەمە)دا کرد، عوبێدەی کوڕی زوبێر هاتە لای ولەگەڵ خۆی بردو پەنایدا، ئەمجا بۆ لای (عبداللە)ی بردو گوتی: کە پەنامداوە، عبداللە گوتی: بەڵێ، سەبارەت بەمافی خۆم لەپەنادایە، بەڵام تۆڵەی ئەو کەسانەی لێ دەکەمەوە کەلە (مەدینە) ئازاری داون.[1]

عبداللە عەمرۆی برای بەپێوە ڕاگرت، بانگی بەندکراو و سزادراوانی کرد تۆڵەی لێ بسێننەوە، هەرکەسێك بهاتبایە دەبوایە شێوەی سزاکەی باس بکردبایە، عبداللە پێ ی دەگوت: چی بەسەر هێناوی ئاوای بەسەر بهێنەوە، سەرچاوەکان دەڵێن: عەمرو ڕووبەڕووی لێدانێکی زۆر بۆوەو هەر لەژێر ئەو لێدانەشدا مرد.[2]

ئەنجامی ئەم هێرشە بەسەرکەوتنی عبدالله و بزوتنەوەکەی تەواو بوو، عبداللە زیرەکی ولێزانی خۆی سەلماندو توانی کێشەکە بەباری بەرژەوەندی خۆیدا ئاوەژوو بکاتەوە دوای ئەوە کە لە بەرژەوەندی یەزیددا بوو، ئەو لەسەرەتای سەرهەڵدانی بزوتنەوەکەیدا بڵاوی دەکردەوە: ئەو بەیعەتەی ـ لەلایەن معاویەوە ـ بۆ یەزید دانراوە ڕەزامەندی وڕای گشتی موسڵمانانی لەسەر وەرنەگیراوە، دەبێ بۆ کارێکی ئاوا پرس وەرگیرێ؛ بۆیە بانگەشەی بۆ (شورا) دەکرد، تادوو ساڵیش لەتەمەنی بزوتنەوەکە ڕابووردا بەڵام هیچ پێشکەوتنو سەرکەوتنێکی وای بە خۆوە نەبینی شایانی باسکردن بێ، هەروەها هیچ گۆڕانکاریەکیش بەسەر دەسەڵات وهەیمەنەتی دەوڵەتی (ئومەوی)دا نەهات، نەلە حیجاز نەلە هەرێمەکانی تر، عبدالله ئامانجی ئەوە بوو بنەماڵەی ئومەوی هەڵنێو جموجوڵێکی دژ بە یەزیدیان تێدا ڕاست بکاتەوەو دەرەنجام وازی پێ لەم پۆستە بێنێ.

یەزید بەو سوێندەی کەدەبێ عبداللە بەکۆتوبەندەوە بەیعەت بدات کەوتە تەڵەی هەڵەیەکی گەورەوە؛ چونکە ناچێتە مێشکی هیچ کەسێکی ژیرەوە هاوەڵێکی ڕێزداری شەست ساڵە سەر بۆ داوایەکی ئاوای وەك یەزید دانەوێنێ.

---

١ـ الطبقات (١٨٥/٥)، أنساب الأشراف (٣٠١٢/٤) .

٢ـ أنساب الأشراف (٣١٦/٤)، تأريخ الاسلام حوادث سنة ٦١ هـ .

عبدالله توانی کردارەکانی یەزید بەتایبەتی ئەم پەلامارە سەربازیەی بکاتە بەڵگە لەبەر چاوی دانیشتوانی حیجاز، کە یەزید پیاوێکی خۆسەپێنەو شیاوی سەرکردایەتیکردنی موسڵمانانی نیە، هەروەها ئەم ڕووداوە نیشانیدا: کە ئەو خاوەن مافێکی ڕەوایەو ڕووبەڕووی خەلیفەیەکی ستەمکاری وابۆتەوە، کەسواری ئەسپی بڕیارە تاکڕەویەکانی خۆی بووە.

هەڵوێستە توندوتیژەکانی عەمروی کوڕی سەعیدی والی مەدینە هۆیەکی تر بوو بۆزیاتر خۆشەویستبوونی عبدالله لەلایەن خەڵکی حیجازو بەهێز تربوونی بزووتنەوەکەی، دەگێڕنەوە: ئەم والیە لەگەڵ دانیشتوانی مەدینە تووڕەو توند بووەو خۆی پێ گەورە بوو و گوێی بۆ ئامۆژگاری ئەوان نە دەگرت.[1]

گێڕانەوەکان دەربارەی (عەمروی کوڕی زوبێر)ی سەرۆکی دەزگای پۆلیسی مەدینە وسەرکردەی سوپا پەلاماردەرەکەش دەڵێن: خۆ بەزلزان وخۆ پێشایی وستەمکار بووە، بیزانیایە کەسێك لایەنگری (عبدالله)ی برایەتی بەندی دەکردو بەر قامچی دەدا، دەگوترا: عەمرو تورەیەو قسەی لەگەڵ ناکرێت، کەسێك بیدواندبانە پەشێمان دەبۆوە.[2]

ئەم پەلامارە سەربازیەی یەزید بەعەمروی ئەنجامدا بۆ داگیرکردنی (مەککە) هەڵەیەکی یەجگار گەورە بوو؛ بۆیە ئیبن زوبێر توانی کاردانەوەی هەڵەکە لەلایەن جەماوەری حیجازەو بخاتە سەر حیسابی بەرژەوەندی بزووتنەوەکەی.

ئەم پەلامارە نواندنی بێڕێزی بوو لەبەرانبەر (مەککە) ،(مەککە)یەك کە لەسەردەمی نەفامی دا ڕێزو تایبەتمەندی خۆی هەبوو وئیسلام هات وڕێزو پیرۆزی زێدەتری بۆ بڕیاردا.

کاتێك عەمروی کوڕی سەعید بووە والی (مەدینە) چووە سەر مینبەر بەقسەکانی هەستونەستی خەڵکی مەدینەی وروژاند ، دەربارەی عبدالله گوتی: خۆی لە(مەککە) پەناداوە، سوێند بەخودا داگیری دەکەین، ئەگەر بچێتە نێو (کەعبە)وە بەشۆڕی و شکاوی لوتی هەموو ناحەزێك بەسەریدا دەسوتێنین.[3]

کاتێك سوپاکە ساز کرا، کۆمەڵێك هاوەڵ چوونە لای عەمرو زۆریان باسی حورمەت وڕێزو پیرۆزی مەککەو بەیتولحەرام بۆ کرد چەندین ئایەت وفەرموودەیان بەبەڵگە بۆ هێنایەوە، پێیان گوت پەشیمان بێتەوە لەهێرشەکەی، بەڵام نەچووە مێشکیەوەو سوپاکەی بەڕێکرد.[4]

---

١ـ الموفقيات الزبير بن بكار ص١٥٢، نقلاً عن موافق المعارضة ص٥٣١ .

٢ـ أنساب الأشراف (٣١١/٤)، مواقف المعارضة ص٥٣١ .

٣ـ تأريخ خليفة ص٢٣٣ .

٤ـ أنساب الأشراف (٣١٢/٤)، مواقف المعارضة ص٥٣٢ .

(مەروانی کوڕی حەکەم)ی دنیادیدەو سیاسی بەعەمرویی گوت: مەککە داگیرمەکە، لەخودا بترسەو ڕێزو حورمەتی ماڵی خودا مەشکێنە، لەکوڕی زوبێر گەڕێن؛ پیربووەو تەمەنی لەشەست دایە، ئەو پیاوێکی بەئەزموون ودامەزراوو وخاوەن عەزم وئیرادەیە، لەڕای خۆی دانابەزێ وپشتی بەکەس لەهەرد نادرێ، بەخوا ئەگەر نەشیکوژن هێندەی نەماوە بۆ خۆی بەمردنی ئاسایی دەمرێ.

عەمرو پێی گوت: بەخوا شەڕی لەگەڵ دەکەین ولەنێو (کەعبە)دا بەگژیدا دەچین، بالوتبەرزان لوتیان بشکێ)، مەڕوان گوتی: وەڵڵاهی من ئەم پەلامارەم پێ ناخۆشە.[1]

(عبدالله) نازناوی (پەنابەری خودا)ی بەسەر خۆیدا بڕی، کەنازناوێکی کاریگەر بوو، دەستدرێژی بۆ سەر حەرەمی مەککەو پەنابەرانی کارێکە هاوەڵان و شوێنکەوتوانی ئەوان پێی قایل نابن، کەواتە بەرەنگار بوونەوەی سوپایەك، کە دەیەوێ حورمەتی حەرەم بشکێنێ واجبی سەرشانی موسڵمانانە، ئەگەر کەسێك توانای بەرگریکردنیشی نەبێت دەبێت لەمەولا هاوسۆزو لایەنگری بەرگریکارانی ماڵی خودا بێت ولەگەڵ عبداللەی کوڕی زوبێر بێت.[2] بەڵێ کار بەوە گەیشت چۆن عبداللە بەرگری دەکرد خەڵکیش بەگشتی لەلای (طائف)ەوە بەرگرییان لەمەککە دەکرد.[3] ئەم پشتیوانی وهەست وسۆزەی دانیشتوانی حیجاز خستیانە قاڵبی کردارەوە بۆ عبداللە ، بووە مایەی بەهێزتر بوونی بزوتنەوەکەی وفراوانتر بوونی دەسەڵاتی ئەو، هەر ئەمەش بووە هۆکاری سەرکەوتنێکی ئاسان و کەمزیانی ئەو بەسەر عەمرویی کوڕی زوبێرو سوپا هەزار کەسیەکەیدا.[4]

٢ – هێرشی (حەصینی کوڕی نەمیری سکونی)و گەمارۆدانی(عبداللەی کوڕی زوبێر)و سوتای (کەعبە)

ئەم هێرشە سەربازیە لەشام ڕێکخرا، سەرکردەکەی (موسلیمی کوڕی عوقبەی موڕی) بوو، (موسلیم)لە ڕێگادا مرد، (حەصینی کوڕی نەمیری سکونی) بوو بە سەرکردە، چوار ڕۆژ لەمانگی موحەڕڕەم مابوون گەیشتە (مەککە)و سوپاکەی لە نێوان(حەجون)[5] بۆ (بیری

---

١ـ هەمان سەرچاوە (٣١٣/٤) .

٢ـ مواقف المعارضة ص٥٣٢ .

٣ـ أنساب الأشراف (٣١٣/٤) .

٤ـ مواقف المعارضة ص٥٣٣ .

٥ـ (حجون): چیایەکی بەرزە میلونیوێك لە(حەرەم) دوورە .

مـەیمون)[١] دامـەزرا، کەسـنووڕێکی دوورو درێـژە، هـۆی ئـەم کـارەی دەگەڕێتـەوە بـۆ سـەر سروشتی شەڕ لە(مەککە) کە بەمشێوە پێچ دەخواتەوە.

عبداللـه هەسـتاو دەسـتی کـرد بەهانـدانی خـەڵك بـۆ بەرپەچـدانەوەی سـوپاکەی شـام وپاراستنی بەیتوڵلاە، بۆ ئەم مەبەستە خەڵکانی ڕزگار بوو لە ڕوداوی (الحرة)ی مەدینە هاتنە پاڵ بزووتنەوەکەی عبدالله، هـەروەها (نەجدەی کـوڕی عـامیری حەنـەفی) بەسـەرکردایەتی خەڵکانێکی (خەواریج) هاتن پارێزگاری لەمەککە بکەن.[٢]

جێی باسە هێرش و بەرەنگاری دەستی پێکرد، بەڵام ژمارەی جەنگاوەرانی گەڵ عبداللـه کەمتر بوون لەو جەنگاوەرانەی بەشـداری جـەنگی (الحـرة)یـان کـرد، هـەروەها سـوپای شـام بەبەراورد لەگەڵ سوپاکەی عبدالله لەڕووی ژمارەو چـەکو چۆڵەوە زۆرتـرو زیـاتر بـوو؛ بۆیـە لەگەرمەی جەنگدا بـاری بەرژەوەنـدی بـەلای (حەصـین ی کـوڕی نـەمیر)دا کـەوت، ئەمـەش بـەهۆی ئـەوە ژمارەیـەك لـە پـشتیوانە گـەورەکانی عبداللـه بوونـە دەسـتە چـیلەی ئـاگری شەڕەکە، وەك: (مونزیرو ئەبوبەکری کوڕانی زوبێر)ی برایو (موسعەبی کـوڕی عبـدالرحمن)و (حوزافەی کوڕی عبدالرحمن کوڕی عەوام) و (عەمروی کوڕی عوروەی کوڕی زوبێر).[٣]

دوای ٣/ڕەبیعـی یەکـەمی /٦٤ك (حەصـینی کـوڕی نـەمیر) مەنجـەنیقی لەسـەر کێـوی (ئەبوقوبـەیس)[٤] وکێـوی (قەیقـەعان)[٥] دامەزرانـد، (میـسوەری کـوڕی مەخرەمـە)ی گـەورە ڕاوێـژکاری (عبداللـە) بـەهۆ پێکرانـی بەبـەردێکی مەنجـەنیق کـوژرا، بەمـەش گـەورەترین هاریکاری لەدەستچوو، شەڕ لەدەورەی مزگەوتی حەرام پێچی خواردەوە و درێژەی کێشا تـا ئـەوەی تـەواوی شـوێنەکانی عبداللـه دەرکـەوتن و، بـەرە بـەرە سـەنگەرەکانی پێـشەوەی لە(ئەبتەح)[٦] لەدەستدان، جگە لـە (حیجـری ئیـسماعیل) شـوێنێکی تـری بەدەسـتەوە نـەما خۆی تێدا مەلاس بدات.[٧]

---

١ـ (بئر میمون): بیرێکە مەیمونی کوڕی حەزرەمی هەڵی کەندووە .

٢ـ أنساب الأشراف (٣٣٨/٤)، مواقف المعارضة ص ٥٤٥ .

٣ـ جمهرة نسب قريش ص٣٦٢ .

٤ـ (جبل أبي قبيس) : یەکێکە لە دوو چیا وشکەکەی مەککە، بەسەر (صفا)دا دەڕوانێ.

٥ـ (قيقعان): چیایەکە لەمەککە .

٦ـ تأريخ خليفة ص٢٥١، بأسناده صحيح حتى إبن جريج .

٧ـ المحن لأبي العرب ص٢٠٣ .

له ئەنجامی حەڵاڵکرانی شەڕ لەوڵاتی (حەرەم) کەخودا (جلاله)و پێغەمبەرﷺ شەڕیان تێدا حەرام کردووە، موسیبەتی (سوتانی کەعبە) ڕوویدا.[١]

یەزیدی کوڕی معاویە لەنێوەڕاستی مانگی ڕەبیعی یەکەمی ئەو ساڵەدا مرد.[٢] هەواڵی مردنی یەزید - بەهۆی دووری نێوان دیمەشق ومەککە - لەسەرەتای مانگی ڕەبیعی دووەمی ٦٤ك گەیشتە (مەککە).[٣]

سوتاندنی (کەعبە) لەبەرنامەی هیچ کام لەدولایەنی شەڕەکە نەبوو؛ بۆیە بە قەومانی ئەو کارەساتە سام و بیمێکی گەورە لەسەر هەردولا دروست بوو،[٤] یەکێك لەخەڵکی شام هاواری دەکرد: سوێند بەوزاتەی گیانی محمدی لەدەستە هەردولا لەنێو چوون،[٥] (هاوەڵانی عبداللـە) لەترسی بارینی سزا هەموویان لە بەرەبەیانی شەوی سوتانی کەعبەدا لەگەڵ جەنازەی ژنێك چوونە دەرەوەی مزگەوتی حەرام، (عبداللـە)ش سەر لەسوژدە مابۆوەو دەیگوت: ئەی خودایە ئەوەی ڕوویداوە بەدەستی ئەنقەستی من نەبووە، خودایە بەندەکانت بەتاوانی من سزامەدە، ئەمە نێو چاوانمەو لەبەر هەردوو دەستتدایە.[٦]

(خەڵکی شام)یش: ئەگەر چی پێ دەچێ کەسانێکیان تێدا هەبووبێ گەورەیی کەسایەتی (عبدالله ی کوڕی زوبێر)ی وەك پێویست نەناسیبێ،[٧] بەلام کەسیان تێدا نەبووە گەورەییو گرنگی و ڕێزو پیرۆزی کەعبەی نەزانیبێ؛ چونکە لە کاتێکدا گەمارۆی (عبدالله) دەدەن لەنێو کەعبەدا، لەهەمان کاتیشدا لەنوێژەکانیاندا ڕوو دەکەنە(کەعبە)ی پیرۆز، کەواتە مەحاڵە کەسێك لەئەوان هەبووبێ بەدەستی ئەنقەست (کەعبە)ی سوتاندبێ، هەروەها ئەم بابەتە بەبیری (حەصینی کوڕی نەمیر)ی سەرکردەی سوپاکە شیاندا نەهاتووە، کاتێك خزمە نزیکەکانی (عبدالله) و زانایانی پێشین و زانایانی لێکۆڵەر باسی ئەم کارەساتە دەکەن، ئەوا

---

١ـ مواقف المعارضة ص٥٤٨ .
٢ـ أنساب الأشراف (٣٤٤/٤)، تعجيل المنفعة ص٤٥٣ .
٣ـ مواقف المعارضة ص٤٨، أخبار مكة (١٩٧/١) .
٤ـ أخبار مكة (٢٠٣/١) .
٥ـ تأريخ خليفة ص٢٥٢ بأسناد صحيح .
٦ـ مواقف المعارضة ص٥٥٢، الأغاني (٢٢٧/٣) .
٧ـ مواقف المعارضة ص٥٥٢، حلية الأولياء (٣٣٦/١) .

نایدەنە پاڵ هیچ کەس وهیچ کام لەلایەنەکانی شەڕکەر؛ (هیشامی کوڕی عورووەی کوڕی زوبێر) دەڵێ: شەڕیان لەگەڵ (ئیبن زوبێر) کرد، (کەعبە) لەماوەی گەمارۆداندا سوتا.[١]

(ئیبن عبدالبر) دەڵێ: لەو گەمارۆیەدا (کەعبە) ئاگری گرت.[٢] (إبن حجر) دەڵێ: ئەمجا سوپاکان بە ئامانجی کوشتاری (إبن الزبیر) بەرەو مەککە بەڕێ خران، جەنگیان لەگەڵ کردو لە ڕۆژانی گەمارۆدا (کەعبە) ئاگری گرت.

بێگومان کەس لەخەڵکی شام نیازی سوکایەتیپێکردنی (کەعبە)ی پیرۆزی لەدڵدا نەبووە، بەڵکو هەموو موسڵمانان (کەعبە) بە گەورەو پیرۆز دادەنێن، سەربازانی شام تەنها مەبەستیان گەمارۆدانی (ئیبن زوبێر) بووە نەك (کەعبە)، بە مەنجەنیقەکانیان(عبداللە ی کوڕی زوبێر)یان کردبووە ئامانج نەك (کابە ی پیرۆز)، (یەزید) کەعبەی نەڕوخاندووەو نەسوتاندووە، هەروەها جێگرو وەکیلەکانیشی ئەم کارەیان لە بەرنامەدا نەبووە، ئەمە کۆڕای موسڵمانانە.[٣]

بەم جۆرە یەکێك لەئەنجامە تاڵەکانی ئەم شەڕەی نێوان (حەصینی کوڕی نەمیر)و (ئیبن زوبێر) سوتانی (بەیتو لحەڕام) بوو.[٤]

کاتێك (حەصین) هەواڵی مردنی (خەلیفە)ی پێگەیشت یەکسەر نوێنەری ناردە لای (عبدالله)، گوتی: (ئەمشەو شوێنی گفتوگۆی نێوانمان (ئەبتەح)ە، تەوەری گفتوگۆ بریتی بوو لەمەسەلەی خیلافەتی دوای یەزید، هەندێك لەو قسانەی (حەصین) کە لەڕووی (عبدالله)دا کردنی ئەوە بوو، کە پێشنیاری وەرگرتنی پۆستی خیلافەتی بۆ دەکرد،پێی گوت: (ئێستا ئەو پیاوە - واتە یەزید - مرد، تۆ لەهەموو کەس لەپێشتری بۆ وەرگرتنی پۆستی خیلافەت، هەستە وەرە لەگەڵمان بۆ شام تابەیعەتت بدەینێ، ئەم سەربازانەی لەگەڵ منن؛ هەموویان پیاو ماقوڵ و سوارچاکانی وڵاتی شامن ، بەڵێن بێ دووکەس لەسەر - بەیعەتدان بەتۆ - ناکۆك نابن، دەچین بۆ ئەوێ و خەڵکی هێمن دەکەینەوەو بارودۆخیش ئاسایی دەبێتەوە، تۆماری خوێنی ڕژاوی نێوان ئێمەو ئەهلی (حوڕڕە)و ئێمە وئێوە دادەخەین و لاپەڕەی سپی هەڵدەدەینەوە)، عبدالله گوتی: (چۆن حیساب بۆ ئەو خوێنە نەکەم! بەخوا دەبێ بەرانبەر کوژراوێکماندا دە کەستان لێ بکوژینەوە، (حەصین)بە نهێنی

---

١ـ الإصابة (٩٤/٤) عن الزبير بن بكار بسند صحيح .

٢ـ الإستيعاب (٢٤٣/٣) .

٣ـ منهاج السنة (٤٤٧/٤)، مواقف المعارضة ص٥٥٣ .

٤ـ مواقف المعارضة ص٥٥٤ .

قسەی دەکردن، بەڵام (عبداللە) یەکبەخۆ دەنگی هەڵدێناو دەیگوت: (بەخودا نایکەم)، حەصین پێی گوت: دەك ئەو کەسە خەجاڵەت بێ دوای ئەمە بەڵێنت دەداتێ، من گومانی ڕایەکی باشم لێ چاوەڕێ دەکردی، نابیستی من بەنهێنی قسەت بۆ دەکەم و تۆش بەدەنگی بەرز لەگەڵم دەدوێ ی، بانگت دەکەم بۆ (خیلافەت) و تۆش هەڕەشەی کوشتنم لێ دەکەی.[1]

دوای ئەوە لێك جیابوونەوە، (عبداللە) بۆی دەرکەوت بەهەڵە داچووە؛ بۆیە ویستی هەڵەکە ڕاست بکاتەوە، کاتێك (حەصین) خۆی وسوپاکەی بارگەیان پێچایەوە و ویستیان بەرەو شام بگەڕێنەوە، (عبدالله) نوێنەری نارده لاو، پێی گوت: (دەربارەی پێشنیارەکەت ـ کەبێمە شام ـ، ئەوە ناکەم، چونکە پێم خۆش نیە (مەککە) بەجێ بێڵم، هەر لەوێ بەیعەتم بدەنێ، منیش دڵنیاتان دەکەم کەدەتانخەمە هێمنی و ئاسایشەوەو بە دادپەروەری حوکمڕانیتان دەکەم)، حەصین وەڵامی دایەوە: ئەگەر خودی خۆت نەیەیت نابێ، چونکە کەسانێکی زۆری بنەماڵەی (بەنی ئومەییە) داوای ئەم پۆستە دەکەن وخەڵکیش پشتگیریان دەکات! دوای ئەمە من هیچم لەدەست نایە.[2]

البلاذري دەڵێ: عبداللەی کوڕی زوبێر داوای لەحەصین کرد مۆڵەتی بدا، تا ڕاوێژ بەهاوەڵانی دەکات، بەڵام هاوەڵەکانی چوونە شامیان ڕەت کردەوە.[3]

هەڵبەتە پەی بردن بەناخی عبدالله و بۆ چوونەکانی لەزەینی دا دێن ودەچن سەبارەت بەڕەتکردنەوەی پێشنیارەکەی حەصین کارێکی گرانە، بەڵام دەتوانین بەچاوی پەندوەرگرتن لەبارودۆخی سیاسی ئەوکاتەی حیجاز[4]، ئاماژە بە هەندێك هۆکار بکەین:

أـ ئەم جۆرە پێشنیارە لەلایەن کەسێکی وەك (حەصین)ەوە قابیلی قبوڵ نیە؛ چونکە ئەو سیفەتێکی ڕەسمی وسیاسی ئاوای نیە لەدەوڵەتی (ئومەوی)دا بتوانێ بڕیاری بەڵێنی ئاوا سەر بەخۆ بدات، لەگەڵ ئەوەشدا دەیگوت: ئەو سەربازانەی لەگەڵیدان پیاو ماقوڵ وسوارچاکانی شامن، بەڵام چۆن دەچێتە مێشکەوە (عبدالله) متمانە بەسەرکردەی سوپایەك بکات کە تادوێنی پەلاماری داوەو لەگەڵی جەنگاوە، لەلایەکی ترەوە دڕایەتی لەنێو قسەکانی (حەصین)دا دەرکەوت بەگوتەی: (ئەگەر خودی خۆت نەیەیت بۆ شام، بەچاوی خۆت

---

١ـ تأريخ الطبري (٦/٤٣٦) .

٢ـ تأريخ الطبري (٦/٤٣٦) .

٣ـ أنساب الأشراف (٤/٥٧،٥٨)، عبدالله بن الزبير، د.شحادة الناطور ص١٠٧ .

٤ـ عبدالله بن الزبير، ماجد لحام ص١١٥ .

کەسانێك لەنێو بنەماڵەی (بەنی ئومەییە) دەبینی کەداوای پۆستی خیلافەت دەکەن وخەڵکیش پشتیوانیان دەکەن.[١]

ب ـ (حەصین) یەکێك بوو لەسەرکردەکانی جەنگی (حوڕڕە)، ژمارەیەك لەڕزگاربوانی ئەم جەنگە لەدەورەی (عبداللە) بوون، بۆ ئەوەی گومانێك لەدڵ ودەروونی ئەواندا پەیدا نەبێت (عبداللە) بەدەنگی بەرز قسەی لەگەڵ (حەصین)دا دەکرد، هەر لەبەر ئەمەش بەڕاشکاوی گوتی: ئەو لەبەرامبەر یەك نەفەری کوژراوی (مەدینە) بەکوشتنەوەی کەمتر لە دەنەفەر ڕازی نابێت لەسوپاکەی (حەصین)دا.[٢]

ج ـ تا ئەوکاتە (عبدالله) لەشامدا بێ پشتیوان و هاوهەڵوێست بوو، خەڵکی شامیش ڕێزو خۆشەویستی وسەروەری ئومەویەکانیان قبوڵ بوو.

د ـ (عبدالله) سوپایەکی ڕێکخراوی سەربازی وەك (سوپای ئومەوی) نەبوو، دەتوانین بە سەربازەکانی بڵێین (بەرگریکارانی (مەککە)و ئیبن زوبێر) و بەس؛ چونکە ئەم جەنگاوەرانە لەکاتی ناخۆشیدا لەدەورەی کۆدەبوونەوەو لەکاتی خۆشی وئاساییدا بڵاوەیان لێ دەکردو دەچوونەوە سەرکارو پیشەی خۆیان، ئەگەر ئیبن زوبێر سوپایەکی سەربازی ڕاهێنراوی تایبەتی هەبوایە بەجۆرێك توانیبای سەرکەوتن بۆ مسۆگەر بکات، ئەوا لەگەڵ (حەصینی کوڕی نەمیر) بەرەو شام دەڕۆیشت.[٣]

---

١ـ تأريخ الطبري (٦/٤٣٦) .

٢ـ عبدالله بن الزبير، ماجد لحام ص١١٦ .

٣ـ عبدالله بن الزبير، د.شحادة الناطور ص١٠٩،١١٠ .

# باسی شەشەم

## یەکەم: مردنی یەزیدی کوڕی معاویە:

بەقسەی هەندێك مێژوونوس: یەزید لە١٤/ڕەبیعی یەکەمی/٦٤ك لەگوندی (حەووارین)ی سەربەشاری (حمص)ی وڵاتی شام لەتەمەنی ٣٨ساڵیدا مرد.

هیشامی کوڕی وەلیدی مەخزومی دەگێڕێتەوە، کە (زوهەری) لەزاری باپیریەوە تەمەنی (خەلیفە)کانی نووسیوە، دەربارەی (یەزید) دەڵێ:

یەزیدی کوڕی معاویە لەتەمەنی ٣٩ساڵیدا مردووە، ماوەی خیلافەتی ٣ساڵ و٦ مانگ بووە، گوتراویشە: ٣ساڵ و٨مانگ بووە.[1]

ئەبو مەعشەر دەڵێ: یەزیدی کوڕی معاویە لەڕۆژی ٣شەممە ١٤/ڕەبیعی یەکەم مردووە، ماوەی خیلافەتی ٣ ساڵ وحەوت مانگ و٢٢ڕۆژ بووە، معاویەی کوڕی نوێژی لەسەرکرد،[2] گوتراویشە: ماوەی خیلافەتی ٣ ساڵ و ٩ مانگ چەند ڕۆژ کەم بووە،[3] نەخشی ئەنگوستیلەکەی (ربُّنا اللّه) بوو.[4]

## دووەم: خیلافەتی معاویەی کوڕی یەزید:

معاویەی کوڕی یەزید سێهەمین خەلیفەی ئومەویە، نازناوی: (ئەبو یەزید) یان (ئەبو عبدالرحمن)ە، باوکی: یەزیدی کوڕی معاویەی کوڕی ئەبو سوفیانە، دایکی: ئومو هاشیم کچی ئەبو هاشم ی کوڕی عوتبەی کچی ڕەبیعەیە،[5] پێ ی دەگوترا: معاویەی بچووك،[6] دوابەدوای مردنی (یەزید)ی باوکی لە١٤/ڕەبیعی یەکەمی/٦٤ك بەیعەتی خیلافەتی پێدرا.

ڕوخساری معاویە ﵀: ڕەنگی سپی بوو، مووی سەرو ڕیشی پڕ بوو، چاوەکانی گەورە بوون، قژی سەری لولپێچ بوو، لوتی باریك وشوشەیی وبچوك بوو، سەری خڕبوو، دەموچاوی

---

١ـ تأريخ الطبري (٦/٤٣٣) .

٢ـ هەمان سەرچاوە.

٣ـ تأريخ القضاعي ص٣٢٩ .

٤ـ هەمان سەرچاوە.

٥ـ تأريخ الطبري (٦/٤٣٤) .

٦ـ الأمويون بن المشرق والمغرب (١/٢٨٦) .

جوان بوو، مووەکانی ریشی پڕونەرموداوداو بوون، جەستەی ڕێکو پێك بوو، پیاوێکی تا بڵێی ساڵح وخودا پەرست بوو.[١]

١- ماوەی حوکمڕانی:

مێژوو نووسان سەبارەت ماوەی حوکمڕانی (معاویەی کوڕی یەزید) جیاوازیان زۆرە ، جیاوازیەکە لەنێوان (٢٠)[٢] ڕۆژ تا(٣) مانگدا دێت و دەچێ، وەك دەردەکەوێ ماوەی(٣) مانگە کەڕاستتر بێ، هەندێك مێژوو نووس دەڵێن ماوەی (٤٠) ڕۆژ بووە، لەماوەی حوکمڕانی خۆیدا هەر نەخۆش بووە؛ بۆیەشە چ چالاکیەکی ئەو کە لە ماوەی حوکومەتەکەیدا ئەنجامیدابن بەرچاو نایەن، نەخۆشیەکەی هێندە توند بووە هەتا نەیتوانیوە پێشنوێژیش بۆ خەڵك بکات، هەتا (معاویە) وەفاتی کرد (زوحاکی کوڕی قەیس) پێشنوێژی دەکردو کاروباری خیلافەتی هەڵدەسوڕاند، (زوحاك) لەسەر ئەم کارەی بەردەوام بوو تا ئەو کاتەی مەڕوانی کوڕی حەکەم کەوتە سەر حوکم لەشام.[٢]

٢ - دابەزینی لە پۆستی حوکمڕانی بەجێهێشتنی بۆ شوڕا:

معاویەی کوڕی یەزید هەستی بەخۆی کرد کە کەوتۆتە گیانەڵاوە، جاڕیدا باهەموو خەڵك بێنە نوێژی جەماعەت، پاش تەواو بوونی نوێژ وتارێکی بۆ دان، لەو قسانەی کردنی: من کاروباری ئێوەم کەوتۆتە بەردەست ولەڕاپەڕاندنیدا لاوازم، ئەگەر حەزدەکەن بۆ پیاوێکی بەهێزی بەجێ دێڵم چۆن (صدیق) بۆ (عومەر)ی بەجێهێشت، ئەگەر دەشڵێن بەجێ ی دێڵم بۆ شوڕایەکی (٦) نەفەری چۆن (عومەر) بەم شێوەیە ڕەفتاری کرد، من لەم کاتەدا کەسێکی واشك نابەم لە نێو ئێوەدا بۆ ئەم کارە گونجاوو شیاو بێ، وازم لەخیلافەت هێنا، خۆتان کێ بەگونجاو وشیاو دەزانن بیکەنە فەرمانڕەوای خۆتان، ئەمجا لەسەر مینبەر دابەزی و چووە ماڵەوە، تاوەفاتی کرد لەماڵەوە بوو و دەرنەچوو.[٤]

(معاویەی کوڕی یەزید) ویستی پێیان بڵێ: ئەو نە وێنەی (عومەر)ی دەست دەکەوێ، کە(ئەبوبەکر) داینا، نەوێنەی ڕاوێژکارانێکیشی دەست دەکەوێ، کە(عومەر) دایاننا؛ بۆیە ئەم ئەرکەی بەخۆیان سپارد.

لە گێڕانەوەکەی (إبن الأثیر)دا ئەمەی بەڕاشکاوی گوتووە کەدەڵێ: (بەلام پاش حەمدو

---

١ـ البدایة والنهایة (١١/٦٦٣) .

٢ـ هەمان سەرچاوە (١١/٦٦٢) .

٣ـ البدایة والنهایة (١١/٦٦٣) .

٤ـ البدایة والنهایة (١١/٦٦٣،٦٦٤) .

سەنا: من لە بەرانبەر ڕاپەڕاندنی کاروبارتاندا بێ هێزو دەستە پاچە بووم، چاوم لەکەسێکی وەك (عومەری کوڕی خەتتاب) گێڕا کە(ئەبوبەکر) کردیە خەلیفە، دەستم نەکەوت، گەڕام بەدوای (٦) کەسی وێنەی (٦) ڕاوێژکارەکەی (عومەر) داینان دەستم نەکەوتن، خۆتان لەپێشترن بۆ کاروبارتان، کێتان حەز لێیە بۆ ئەم کارە هەڵیبژێرن)، ئەمجا چووەماڵەوە وتامرد خۆی پەنهان کرد.[١]

ئەم هەڵوێستەی بەڵگەیە کە ئەو ناڕازی بووە لەسەر مەسەلەی گواستنەوەی خیلافەت لەشوراوە بۆ میرات و وەسێت،[٢] ئەو ڕازی نەبوو کەسێك لەبنەماڵەی خۆی بکاتە وەلی عەهدی خۆی، پێیان گوت: ئەم پەیمانە بخە ئەستۆی کەسێکی نێو بنەماڵەکەت، وەڵامیدانەوە: بەخوا شیرنایەتی سەرۆکایەتیکردنی ئێوەم تام نەکردووە، جا چۆن تاوانەکەی هەڵدەگرم، ئێوە پەلەی چەشتنی شیرنایەتیەکەی دەکەن، منیش هەست بە تاڵاییەکەی دەکەم، خودایە من لێ ی بەریم و وازی لێ دێنم.[٣]

لەگێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: پێی گوترا: ئایا وەسێت ناکەی؟ گوتی: تاڵاییەکەی بکەمە توێشوی قیامەتم و شیرنایەتیەکەی بۆ (بەنی ئومەییە) بەجێ بێڵم؟![٤]،دابەزینی (معاویەی کوڕی یەزید) لەپۆستی حوکمڕانی بەڕوداوێکی تاقانەی نێو مێژووی مرۆڤایەتی دادەنرێ، زانیومانە سەرۆکانێك وازیان لە پۆستی خۆیان هێناوە بەڵام لەژێر گوشاری ماددی یان مەعنەویدا بووە، بەڵام شایەك یان سەرۆکێك واز لەپۆستەکەی بێنێ چونکە کە سانێکی لە پێشترو شیاوتر هەن لەنێو گەلەکەیدا بۆ ئەو پۆستە، ئەوا بەسەر ئەم جۆرە سەرۆکانەدا نەکەوتوین، چ حیساب لەگەڵ خۆکردنێك لەم حیسابەی معاویە لەگەڵ خۆی کرد جوانترو بەرزترە؟!.[٥]

ئەگەر (معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان)ی یەکەم خەلیفەی ئومەوی، خیلافەتی لەشوراوە گواستەوە بۆ مەلیکایەتی، ئێستا لەم بارودۆخەدا (معاویەی دووەم)ی نەوەی و سێهەم خەلیفەی ئومەوی خیلافەت لە مەلیکایەتیەوە دەگوازێتەوە بۆ شورا.

---

١ـ الكامل في التأريخ (٦٠٥/٢) .

٢ـ العلم الأسلامي في العصر الأموي ص١٣٧ .

٣ـ مروج الذهب (٨٢/٣) .

٤ـ البداية والنهاية (٦٦٣/١١) .

٥ـ نظام الحمك في الشريعة والتأريخ (١١٦/١) .

چاك وایە بەچاوی دادپەروەری و ویژدانەوە بڕوانرێتە دەوڵەتی ئومەوی وەهەرحیساب لەسەر لانی یەکەم واتە مەلیکایەتی وخۆسەپێنی دەوڵەتەکە نەکرێت، بەڵکو حیسابیش بۆ لانی دووەم واتە چاکسازیەکەی معاویەی دووەم وگواستنەوەی مەلیکایەتی بۆ شوڕاش بکرێت.[1]

٣ – کاتێك مرد تەمەنی چەند بوو؟ کێ نوێژی لەسەر کرد؟

معاویەی کوڕی یەزید لەتەمەنی (٢١)ساڵیدا مرد، دەشڵێن: ٢٣ ساڵ و (١٨) ڕۆژ بوو، دەڵێن: (١٩) ساڵ بوو، دەڵێن: ٢٠ ساڵ بوو، دەڵێن: ٢٣ ساڵ بوو، دەڵێن: ١٨ ساڵ بوو، دەڵێن: ١٥ ساڵ بوو، خودا چاکتر دەزانێ.

خالیدی برای نوێژی لەسەر کرد، دەشڵێن: عوسمانی کوڕی عەنبەسە نوێژی لەسەر کرد، دەڵێن: وەلیدی کوڕی عوتبە نوێژی لەسەر کرد، ئەم گێڕانەوەی دوایە ڕاستە؛ چونکە معاویە وەسێتی بۆ وەلید کرد بوو نوێژی لەسەر بکات، (مەڕوانی کوڕی حەکەم)یش ئامادەی ناشتنەکەی بوو،[2] مەڕوان گوتی: دەزانن کێ بوو ئەسپاردەتان کرد؟ گوتیان: بەڵێ: معاویەی کوڕی یەزید بوو، (مەڕوان) گوتی: (ئەو) ئەو (ئەبو لەیلا)یە یەکە (أرْنَـمُ الفَـزاري) دەربارەی گوتوویەتی:

إني أرى فتنة تغلي مراجلها والملك بعد أبي ليلى لمن غلبا.[3]

واتە: چاوم لە ئاشوبێکە مەنجەڵەکانی زڵق دەدەن ، حوکم لە دوای ئەبولەیلا بۆ ئەو کەسەیە زاڵ دەبێ.

٤ – تەنگژەیەکی سامناك دوای مردنی معاویەی کوڕی یەزید:

معاویەی کوڕی یەزید تەنگژەیەکی ترسناکی بۆ دوای خۆی دروستکرد، خالیدی برای منداڵ بوو، دەسەڵاتی (عبداللەی کوڕی زوبێر)یش هەر ئەستوور و فراوان دەبوو، خەڵکێکی زۆری ژێردەسەڵاتی ئومەوی بەیعەتیان دایە، بەشێکی سوپای شام لەسەروی هەموویانەوە پۆلێك بە سەرکردایەتی (زوحاکی کوڕی قەیس)ی فەرماندەی دیمەشق بڕیاریاندا بەیعەت بە(عبدالله) بدەن، تا حاڵ بەوەگەیی (مەڕوانی کوڕی حەکەم) سەرگەورەی ئەوکاتی (بەنی

١ـ الدولة الأموية المفترى عليها ص٢٩٣ .
٢ـ البداية والنهاية (٦٦٢/١١،٦٦٣) .
٣ـ هەمان سەرچاوە (٦٦٤/١١) .

ئومەییە) بیری لەچوونە لای (عبدالله) کردەوە تا بەیعەتی پێبداو ئەمان وزەمانی لێ وەربگرێت، بەڵام باقی ئەو سەربازو سەرۆکانەی هۆزەکانی تری یەمەنی لە شام، کەبە تواناترین پشتیوانانی بەنی ئومەییە بوون وخاڵانی یەزید بوون، بەسەرکردایەتی (حسانی کوڕی مالیك) نەیانهێشت خیلافەت لە(بەنی ئومەییە) دەرچێت وبەیعەتیان نەدا بە(عبدالله)، ناکۆکی‌و پشێویەکی زۆر ڕوویداو (شام) شەش مانگ بێ سەرۆك وپێشەوا بوو، پاشان ڕێکەوتن لەسەر بەستنی کۆبوونەوەیەك بۆ ڕاوێژکردن لەسەر دیاریکردنی کەسێکی شیاوو گونجاو بۆ پۆستی خیلافەت ودەرەنجام بڕیارێکی بۆ دەربکەن.[1]

(معاویەی کوڕی یەزید) بە دوایین خەلیفەی لقی (سوفیانی) دادەنرێ، دوای ئەو خیلافەت لە لقی (سوفیانی)یەوە بۆ لقی دووەمی تایەفەی (بەنی ئومەییە) واتە لقی (مەڕوانی) گوازرایەوە، یەکەم دەسەڵاتبە دەستی ئەم لقە (مەڕوانی کوڕی حەکەم) بوو، زۆربەی لێکۆڵەرو مێژوو نووسان بەناوی (خەلیفە) ناوی ناهێنن، دەڵێن ستەمکار بووەو لەدژی خیلافەتی ئەمیری ئیمانداران (عبداللەی کوڕی زوبێر) دەرچووە، سەبارەت بە(عبدالملك)ی کوڕیشی هەمان هەڵوێستیان هەیە تا ئەو کاتەی (عبدالله) شەهید دەبێ، کۆڕای جەماوەری موسڵمانانیش لەسەر ئەمەیە.[2]

بەمردنی (معاویەی کوڕی یەزید) کۆتایی بە دەوڵەتی (سوفیانی) هات ودەوڵەتی (زوبێری) دەرکەوت، بەڵام بەردەوام نەبوو؛ چونکە (بەنی مەڕوان) توانی کۆتایی بەم دەوڵەتە بێنێ.

---

١ــ النظريات السياسية الإسلامية، محمد ضياء الدين الريس ص٢٠٢ .

٢ــ الأمويون بين المشرق والمغرب ص٢٠٩ .

# ناوەڕۆك